لادیی، دیهاتی ◌ روستایی

**agri-** = agro-

**agribusiness** /ˈæɡrɪbɪznəs/ *noun*
سەوداگەری کشتوکاڵی، سەوداوەرزێری (= پیشەسازیی کە پێوەندی بە بەرهەمهێنان و فرۆشتنی بەرهەمە کشتوکاڵییەکانەوە هەیە) ◌ اگری‌بیسنس

**agricultural** /ˌæɡrɪˈkʌltʃərəl/ *adjective*
کشتوکاڵی، جووتبەندەیی، وەرزێری، جووتیاری، وەرزیانە: *agricultural policy* ◊ *agricultural production* ◊ *agricultural land* ◊ *agricultural development* (agriculturally *adv*: لەباری کشتوکاڵەوە یان وەرزێرییەوە) ◌ کشاورزی، زراعتی

**agriculturalist** /ˌæɡrɪˈkʌltʃərəlɪst/ *noun*
پسپۆڕ یان شارەزای کشتوکاڵ ◌ متخصص یا کارشناس کشاورزی

**agricultural region** *noun*
ناوچەی کشتوکاڵی ◌ منطقەی کشاورزی

**agriculture** /ˈæɡrɪkʌltʃə(r)/ *noun*
کشتوکاڵ، کشت، جووتبەندەیی، وەرز، وەرزێری: *The number of people employed in agriculture has fallen in the last decade* ◌ کشاورزی

**agrimony** /ˈæɡrɪməni/ *noun, pl.* agrimonies
گیاجگەر، گیایێ لە تیرەی گوڵەباخ بە گوڵی زەردەوە، لە خێزانی rose [تۆخم *Agrimonia*] ◌ غافث

**agrion** /ˈaɡrɪɒn/ *noun*
کێویلک: جۆرێ damselfly ی گەورە کە دەبریسکێتەوە [تۆخم *Agrion*: گەلێ جۆرن] (بنەڕەت: نیوتیری *agrios* یۆنانی "wild") ◌ اگریون

**agriscience** *noun*
بەکارهێنانی زانست لە بواری کشتوکاڵدا، کشتوکاڵناسی (agriscientist *n*: زانستەوان لە بواری کشتوکاڵدا، کشتوکاڵناس) ◌ علم کشاورزی

**agro-** /ˈæɡrəʊ, US ˈæɡroʊ/ *prefix*
پێشگر: 1 سەربە کشتوکاڵ، سەربە گڵ یان خاک 2 کشتوکاڵی و... (بنەڕەت: لە *agros* یۆنانییەوە "field") ◌ پیشوند: 1 وابستە بە کشاورزی یا خاک 2 وابستە بە کشاورزی و...

**agrobiology** *noun*
زیندەناسی خاک یان گڵ، لقێکی زیندەناسی سەبارەت بە زانستی خاک یا گڵ و پێچارانی ڕووەک (agrobiological *adj*: سەربە ئەگرۆبیۆلۆژی؛ agrobiologist *n*: ئەگرۆبیۆلۆژیست) ◌ اگروبیولوژی

**agrochemical** *noun*, also agrichemical
مەتریالی کیمیایی کە لە بواری کشتوکاڵدا بەکاردێتن، مادە یا ماکێکی کشتوکاڵی (وەک insecticide یا herbicide) ◌ آگروکمیکال

**agro-industrial** *adjective*
سەربە کشت و پیشەسازی یا کشتوسازی ◌ وابستە بە کشت و صنعت

**agroecology** *noun*
ژینگەناسی کشتوکاڵی، بووناسی کشتوکاڵی (agroecological *adj*) ◌ بوم‌شناسی کشاورزی یا زراعی

**agro-industry** *noun*
کشت و پیشەسازی، کشتوسازی ◌ کشت و صنعت

**agrology** *noun*
خاکناسی، گڵناسی ◌ دانش خاک

**agronomical** *adjective*, also agronomic
سەربە agronomy (agronomically *adv*) ◌ وابستە بە دانش زراعت

**agronomist** /əˈɡrɒnəmɪst, US əˈɡrɑːn-/ *noun*
1 جووتیار، جووتبەندە، وەرزێر، کشتکار 2 ئەندازیاری کشتوکاڵ 3 شارەزای کشتوکاڵ، ئەگرۆنۆمیست ◌ 1 کشاورز 2 مهندس کشاورزی 3 کارشناس کشاورزی

**agronomy** /əˈɡrɒnəmi/ *noun*
1 زانستی کشتوکاڵ 2 ئەندازیاریی کشتوکاڵ یان کشتوکاڵی ◌ 1 دانش زراعت 2 مهندسی کشاورزی

**agrostology** /ˌaɡrəˈstɒlədʒi/ *noun*
لقێ لە ڕووەکناسی سەبارەت بە گژوگیا ◌ اگرواستولوژی

**aground** /əˈɡraʊnd/ *adverb, adjective*
(کەشتی) لەقوڕچەقیو، لەکەنار، زەویکێش ◌ بە گل نشستە

**aguardiente** /əˌɡwɑːdɪˈentɪ, Spanish aɣwarˈðjente/ *noun*
(لە وڵاتانی سپانیاییزماندا) لیکۆرێکی دڵۆپێنراو، شێوەی براندی دەدا (بنەڕەت: لە سپانیایی، لە *agua* "ئاو" + *ardiente* "ئاورین") ◌ آگواردینتی

**ague** /ˈeɪɡjuː/ *noun*
یاو، لەرز، لەرزوتا، تاولەرز (بنەڕەت: بە ڕێگای فەرەنسەوە لە *acuta (febris)* لاتینی سەدەکانی نیوەڕاست "acute (fever)") ◌ مالاریا، تب و لرز

**aguish** /ˈeɪɡjuːɪʃ/ *adjective*
لەرز دێنی، لەرزوتادار، تاولەرزهێنەر، لەرزوتای پێوەیە ◌ لرزآور

**ah** /ɑː/ *interjection*
ئاخ، وەی، ئائیش: *Ah, this coffee is good* ◊ *Ah, there* ◊ *Ah, but that may not be true*

*you are!* ئاخ، وی

**aha** /ɑːˈhɑː/ *interjection*

*Aha! So that's* ئەهەم، ئەهە، وایە، ئەری. ئەو *where I left it!* وهوه. ههن

**AHA** *abbreviation* alpha-hydroxy acid

**Ahab** *noun*

ئەهاب، ئاهاب: یەکێ لە پادشایانی ئیسرائیلی کە سەدەی نۆیەمی بەرلە زایین و مێردی Jezebel

اهاب

**ahchoo** /ɑːˈtʃuː, US əˈtʃuː/ = atishoo

**ahead** /əˈhed/ *adverb, adjective*

پێش، بەر، پێش‌تر، زووتر، لە پێشی، لە بەرەوە، لەوەپێش (ahead of: لە پێشی، بەرلە، لە پێشەوە

جلو، پیش، جلوتر، به سوی جلو، قبل از، قبل

**ahem** *interjection*

ئەهە (دەنگی خاوێن کردنەوەی سینگ ـ گەروو) اهم

**ahimsa** /əˈhɪmsɑː/ *noun*

(لە ئاینی هیندوو، بوودیزم و جەینیزمدا) ڕێز بۆ هەموو شتە زیندووەکان و پێکنەگەیاندنی ئازار بە بوونەوەرەکان، ئاشتی‌خوازی اهیمسا

**ahistorical** *adjective*

بەبێ دیمەنی یان پێوەندییەکی مێژوویی بدون دورنمای تاریخی

**A horizon** *noun, also* eluvial horizon

ئاسۆی ئەی یان ئەی، چینی سەرەوەی گلەڕەشە، ڕەشەخاک، سەرترین توێی زەوی یان خاک افق ی، سیاه‌خاک

**ahoy** /əˈhɔɪ/ *interjection*

(لە دەریاوانیدا) ئەهۆی، هۆی هوی، هی

**Ahriman** *noun*

ئەهریمەن: دوژمنی ئەهورامەزدا، کە گیانی خراپی و تاریکییە لە Zoroastrianism (بنەڕەت: لە *anrō mainyuš* ئاڤێستییەوە "گیانی دوژمن") اهریمن

**Ahura Mazda** *noun.* Avestan *Ahuramazda* "wise god"

ئەهورامەزدا، خودای باشی و ڕووناکی لە Zoroastrianism دا (لە *Ahuramazda* ئاڤێستاییەوە "خودای ژیر") اهورا مزدا

**AI** /ˌeɪ ˈaɪ/ *abbreviation* 1 artificial insemination 2 artificial intelligence

**aid** /eɪd/ *noun*

1 یارمەتی، ئاری، ئالیکاری، هاریکاری، دەس‌گرتن، دەس‌گیرۆیی، کۆمەک، هەداری، بەهاناچوون، فریاکەوتن 2 شت‌ومەک یان کەرەسەی یارمەتی 1 کمک، یاری، مساعدت 2 وسیلەی کمک

**aid climbing** *noun, also* aiding /ˈeɪdɪŋ/

شاخەوانی بە کەڵوپەلەوە (وەک سنگ کە لە ڕەوەزەکاندا دادەکوترێ، **aid climb** *n*؛ بڕوانە (free climbing آید کلایمبینگ

**aide** /eɪd/ *noun*

1 یاریدەدەر، فریاکەوتوو، ئالیکار، یارمەتی‌دەر، ڕاوێژکار 2 aide-de-camp 3 aide nurse's مددکار، معاون، دستیار، کمک، مشاور

**aide-de-camp** /ˌeɪd də ˈkɒ̃ ˈkæmp/ *noun, pl.* aides-de-camp

یاوەر، ئەفسەرێ لە سپا یان هێزی دەریاییدا کە یاریدەی ئەفسەری گەورەتر دەدا، ئاجوودان آجودان

**aide-memorie** /ˌeɪd mɛmˈwɑː, French ɛd mɛmwaʀ/ *noun*

1 کتێب یان تێبینییێ بۆ یاریدەدانی بیری مرۆڤ 2 یادنامە یان تێبینی دیپلۆماتیک، کورتەی بابەتەکان 1 اید مموری 2 یادداشت دیپلوماتیک

**aidman** *noun, pl.* aidmen

برینپێچی یەکە یان یەکینەی لەشکری یان سەربازی، دواپزشک یا ئاوەڵپزشکی تیبو یەکەیێکی لەشکری یا سەربازی پزشکیار نظامی

**AIDS** /eɪdz/ *abbreviation* acquired immune deficiency syndrome, Aids

***AIDS*** ئێیدز، ئایدز، ئێیدز: *research/education/victims* ایدز

**AIDS virus** = HIV

**aigrette** /eɪˈgret, ˈeɪgret/ *noun*

1 کلاوپەڕ، تووخ، نیشان، جقە، جوقە 2 سۆرەویلک، خەمەخۆرە، شاف (لە فەرەنسەوە بە واتای "egret") 1 جقه 2 مرغ ماهی‌خوار

**aiguille** /ˈeɪgwiːl/ *noun*

نووچکەی تیژی کێو یان زنجیرەکێوێ (فەرەنسی "needle") ایگویل

**aiguillette** /ˌeɪgwɪˈlɛt/ *noun*

دەرزیلە، زنجیرەی سەرشان (بنەڕەت: فەرەنسی "دەرزی چکۆلە") واکسیل‌بند

**aikido** /ʌɪˈkiːdəʊ/ *noun*

ئایکیدۆ (شێوەیێکی هونەری شەڕی ژاپۆنی بەرگری لە خۆ) آیکیدو

**ailanthus** *noun*

(ڕووەکناسی) دارئاسمان tree of heaven، ڕەسەنی ئاسیا و ئەستڕالیا، ئیلانتوس [توخم *Ailanthus*: چەندین جۆرن] ایلانتوس

**aileron** /ˈeɪlərɒn, US -rɑːn/ *noun*

باڵۆچکە، باڵۆکە، باڵەڕاگرە، باڵەهاوسەنگی (فڕۆکە) شهپر

**ailing** /ˈeɪlɪŋ/ *adjective*

1 نەخۆش، ناساخ، سیسەڵە، دەردەدار، لاواز 2 بێبازاڕ 1 بیمار 2 کساد

**ailment** /ˈeɪlmənt/ *noun*

نەخۆشی (سووک)، ناساخی، ناسازی، دەردەداری بیماری، کسالت

**ailurophobia** /ˌʌɪljʊrəˈfəʊbɪə/ *noun*
(لـه)پـشیلەترسی، ترسـێکی زۆر لـه پـشیله ◌ گربەهراسی

**ailurophobe** *noun*
(له)پشیلەترس، کەسێ کە رقی لە پشیلەیە یا لەی دەترسێ ◌ گربەهراس

**aim** /eɪm/ *noun*
1 دۆز، ئامانج، مەبەست، مەبەس، target ،mark، 2 نیشانەگرتن، سێرەگرتن، سێرەگیری 3 (بێباو) guess ،conjecture ◌ 1 هدف 2 هدفگیری

**aimless** /ˈeɪmləs/ *adjective*
بێمەبەست، بێئامانج، بێهوودە، لەخۆوە: *My life seemed aimless* ◌ بیهدف، عبث

**aimlessly** /ˈeɪmləsli/ *adverb*
بـێمەبەسـتانە، لـەخۆوە، سـەرلێشـێواو: *He drifted aimlessly from one job to another* ◌ از روی بیهدفی

**aimlessness** /ˈeɪmləsnəs/ *noun*
بـێمەبەسـتی، لـەخۆرایی، بـێئامـانجی: *He worried about his son's aimlessness and lack of ambition* ◌ بیهدفی

**ain' t** /eɪnt/ *abbreviation* 1 am not, is not, are not 2 has not, have not

**Ainu** /ˈeɪnuː/ *noun, pl.* same or Ainus
1 ئەنـدامی گـەلی رەسـەنی بـاکووری ژاپـۆن 2 زمانی ئەو گەلە، پێدەچێ پێوەندی بە Altaic وە هەبێ (واتاکەی "پیاو، کەس") ◌ اینو

**aïoli** /ʌɪˈəʊlɪ/ *noun,* also aioli
رۆنەسیر، رۆنی سیر (بنەڕەت: لە *ai* پروڤانسی "سیر" + *oli* "رۆن") ◌ روغن سیر

**air** /eə(r), US er/ *noun, adjective*
*n* 1 هـەوا 2 دەموچـاو، روو، سـەکوت، شـێوە، روالەت 3 کەش و هەوا، کەش 4 شنەبا، سریوە 5 هەوا، بەند، سۆزە، ئاواز 6 (airs) خۆنواندن، خۆنیشـاندان *adj* هـوایی ◌ *n* 1 هـوا 2 سـر و وضع، سـیما 3 جـو 4 نـسیم 5 آهنگ، نـوا 6 (در جمع) تظاهر *adj* هوایی

**air bag** *noun*
توورەکە یان کیسەی با، کیسەبا (له ماشێندا بۆ پاراستنی سوار و شۆفیری نێو ماشێن) ◌ کیسه هوا

**airbase** /ˈeəbeɪs, US ˈerb-/ *noun*
بنکەی ئاسمانی، بنکەی فڕۆکە لەشکرییەکان ◌ پایگاه هوایی

**airbed** *noun*
دوشەکی بایی ◌ تشک بادی

**air-bladder** *noun*
(گیانەوەرناسی) توورەکەی با، بادێن، بادان، پزان ◌ کیسەی هوا

**airboat** *noun*
گـەمی ئاسمـانی یـان هـەوایی (بـۆ نێـو زەلکـاوان بەکاردێتری) ◌ قایق هوایی

**airborne** /ˈeəbɔːn, US ˈerbɔːrn/ *adjective*
له حەوادا، لە ئاسمـاندا، لە (حالی) فڕیندا، بە ڕێگای هەوا یـا ئاسـماندا، بە ڕێگای هـەوا یـان ئاسمان راگوێزراو: *airborne* ◊ *-ne allergens troops* ◌ در پرواز، هوایی، از طریق هوا

**air brake** *noun*
باوەسـتێنە، وەسـتێنەی بـایی؛ شـتێکی وا لـەسـەر فڕۆکە ◌ ترمز بادی

**airbrick** *noun*
خشت یا ئاجووری کون(اوی)، خشـتی کونکون یـا هەواکێش ◌ آجر هواکش

**air bridge** *noun*
پردی فڕۆکە (لە بەرامبەر درگای فڕۆکەدا) ◌ پل هواپیما

**airbrush** /ˈeəbrʌʃ, US ˈerb-/ *noun*
رەنگپرژێن (ئامێر، بەهۆی هەوای پەسـتێنراوەوە دەیپرژێنێ) ◌ اربراش

**airburst** *noun*
تەقینەوەی ئاسمـانی (ب.ت. بۆمبی ناوکی) ◌ آیربرست

**airbus** /ˈeəbʌs, US ˈerbʌs/ *noun*
پاسـی ئاسمانی، ئێرباس ◌ ارباس

**air chief marshal** *noun*
ئەفسەرێکی یەکجار پایەبەرز لە هێزی ئاسمـانی بریتانیادا ◌ سپهبد نیروی هوایی

**air combat** *noun*
شەڕی ئاسمانی، شەڕی هەوایی ◌ نبرد هوایی

**air commodore** *noun*
ئەفسـەری هێزی ئاسـمانی بریتانیا (باتشـایی) ◌ سرتیپ نیروی هوایی

**air compressor** *noun*
هەواپەستێن، کۆمپرێسۆری هەوا ◌ کمپرسور هوا

**air conditioned** *adjective*
ئێرکاندیشنید، هەواگۆڕدار ◌ دارای تهویه مطبوع

**air conditioning** *noun*
هەواگونجاندن، هـەواگۆڕی ( air conditioner *n*: هەواگونجێن، دەزگای گونجاندنی هـەوا یـان هەواگۆڕی، هەواگۆڕ(ە) ◌ تهویەی مطبوع

**air-cooled** *adjective*
فێنکـەوەبوو یـان سـاردەوەبوو بـە هـەوا ◌ خنکشونده با هوا

**air cover** *noun*
پشتیوانی ئاسمانی، چەتری ئاسمانی ◌ پوشش هوایی

**aircraft** /ˈeəkrɑːft, US ˈerkræft/ *noun, pl.* same
فڕۆکـە، بـالافڕ: *fighter/transport/military aircraft* ◌ هواپیما

**aircraft carrier** *noun*
فڕۆکەهەڵگر ◌ ناو هواپیمابر

**aircraftman** /ˈeəkrɑːftmən, US ˈerkræft-

noun, pl. aircraftmen

خـوارترین پلـه لـه هێـزی ئاسمـانی بریتانیـا
سـه‌ربازی هێزی ئاسمانی: *Aircraftman John Green* ۞ سرباز نیروی هوایی

**aircraftwoman** /'eəkrɑ:ftwʊmən, US 'erkræft-/ *noun, pl.* aircraftwomen
سه‌ربازی هێزی ئاسمانی (ژن) ۞ سرباز نیروی هوایی

**aircrew** /'eəkru:, US 'erk-/ *noun, pl.* aircrews
ده‌سته‌ی فرۆکه‌وانی، ده‌سته‌ی کارکه‌رانی فرۆکه ۞ خدمه‌ی هواپیما

**air-cushion** *noun*
1 بالنج یان دۆشه‌کی هه‌وایی 2 توێژی هه‌وا، توێی هه‌وا ۞ 1 بالشک بادی 2 لایه‌ی هوا

**airdrome** /'eədrəʊm, US 'erdroum/ = aerodrome

**airdrop** /'eədrɒp, US 'erdrɑ:p/ *noun*
هاتنه‌خواره‌وه‌ی چه‌تر به‌ به‌چه‌تره‌وه‌ ۞ فرود چتربازان

**air-dry** *adjective*
وشکه‌وه‌بووی به‌ هه‌وا وشک بووه‌وه: *air-dried ham* ۞ کالباس خشک

**airedale** /'eədeɪl/ *noun*
جۆری تانجی مووزبری خۆڕه‌نگی له‌ *Airedale* (یۆرکشایر) ۞ ایردیل

**air-fairy** *adjective*
پڕوپووچ، قۆڕ، هیچ، بێ‌بنچینه ۞ واهی

**airfield** /'eəfi:ld, US 'erf-/ *noun*
فڕۆکه‌خانه، جێی فڕۆکه، ڕێستگه‌ی فڕۆکه (چکۆله) ۞ فرودگاه

**air filter** *noun*
پالێوک یان فیلته‌ری هه‌وا، هه‌واپاڵێوک ۞ فیلتر هوا

**airflow** /'eəfləʊ, US 'erflou/ *noun*
ته‌زوو یان ته‌وژمی هه‌وا ۞ جریان هوا

**air force** *noun*
هێزی ئاسمانی: *the US Air Force* > *air-force officers* ۞ نیروی هوایی

**airframe** *noun*
چوارچێوه یان لاشه‌ی فرۆکه (به‌بێ بزوێنه‌که‌ی) ۞ بدنه‌ی هواپیما

**airfreight** *noun*
1 بـاری فرۆکـه 2 گوێزانـه‌وه‌ی ئاسـمـانی یـان هه‌وایی، گواستنه‌وه یان گوێـستـنه‌وه‌ی هه‌وایی ۞ 1 محموله‌ی هواپیما 2 باربری هوایی

**air-freshener** *noun*
بۆنخۆشکه‌ره‌ی ماڵ ۞ ایرفرشینر

**airgun** /'eəgʌn, US 'ergʌn/ *noun*, also air rifle
تفه‌نگی بایی ۞ تفنگ بادی

**airhead** /'eəhed, US 'erhed/ *noun*
1 بنکه‌ی ئاسمانی (هه‌لکه‌وتوو) له‌نێو خاکی دوژمن‌دا، بۆ راگوێستنی بار و سه‌ربازه‌کان 2 (ئافه‌رمی) بنیاده‌می گه‌وج: *She's a total airhead!* (airheaed *adj*) ۞ آیرهد

**air hole** *noun*
کونی هه‌وایی، چاڵی هه‌وایی ۞ منفذ هوایی

**air hostess** *noun*
میوانداری فرۆکه ۞ مهماندار هواپیما

**airily** /'eərəli, US 'er-/ *adverb*
به‌ بێ‌خه‌یالی، که‌مته‌رخه‌مانه ۞ با بی‌قیدی

**airing** /'eərɪŋ, US 'erɪŋ/ *noun*
1 هه‌واگۆڕی، هه‌واخۆری 2 له‌به‌ر هه‌وادا دانان، وشـک‌کردنـه‌وه، کزرکردنـه‌وه، هه‌ڵخـستن 3 ده‌ربڕین، ده‌رنوو 4 بڵاوکردنه‌وه‌ی ته‌له‌فزیۆنی یا ڕادیۆیی ۞ 1 تهویه 2 قرار دادن در معرض هوا 3 ابراز 4 آیرینگ

**airing cupboard** *noun*
کاپ‌بۆردی وشک‌که‌ره‌وه‌ی جل، دۆلابی به‌رگ وشک‌که‌ره‌وه، دۆلابی به‌رگ وشـک‌کردنه‌وه ۞ قفسه‌ی خشک‌کن لباس

**airlane** *noun*
هێڵ یا ڕێی ئاسمانی، ئاسمانه‌ڕێ ۞ مسیر هوایی

**airless** /'eələs, US 'erl-/ *adjective*
بێ‌با، بێ‌هه‌وا: *The night was hot and airless.* ۞ عاری از هوا

**air letter** = aerogramme

**airlift** /'eəlɪft, US 'erl-/ *noun*
پـــردی ئاسمـــانی (هـــه‌وایی)، گواســـتنه‌وه‌ی شت‌ومه‌ک به‌ فرۆکه ۞ پل هوایی

**airline** /'eəlaɪn, US 'erl-/ *noun*
1 هێـلی ئاسمـانی 2 کۆمپانی هێـلی ئاسمـانی 3 هێلی لووله (بۆ گواستنه‌وه‌ی ئاو یان هه‌وا) ۞ 1 خط هوایی 2 شرکت هواپیمایی 3 ایرلاین

**airliner** /'eəlaɪnə(r), US 'erl-/ *noun*
فرۆکه‌ی سوارهه‌ڵگر ۞ هواپیمای مسافربری

**airlock** /'eəlɒk, US 'erlɑ:k/ *noun*
1 ژووررۆچکـه‌ی ڕێکخـستنی په‌سـتانی هـه‌وا 2 بابه‌ست، هـه‌وابـه‌ند، بابه‌ند، هه‌وابه‌ست ۞ 1 ارلاک 2 هوابند

**airmail** /'eəmeɪl, US 'erm-/ *noun*
پۆستی ئاسمانی: *Send it airmail/by airmail* ۞ پست هوایی

**airman** /'eəmən, US 'erm-/ *noun*, or airwoman, *pl.* airmen or airwomen
ئه‌ندامی هێزی ئاسمانی (بریتانیا)، فرۆکه‌وان یا ئه‌ندامی ده‌سته‌ی کارکه‌رانی فرۆکه، ئه‌ندامێکی پله‌نزمی هێزی ئاسمانی ئه‌مریکا ۞ ارمن

**airman basic** *noun*
پله‌داری نزم‌ترین پایه له‌ هێزی ئاسمانی‌دا، سه‌ربازی ساده و بێ‌پایه‌ی هێزی ده‌ریایی ۞ ارمن

بیسیک، سرباز ساده و بدون درجه‌ی نیروی هوایی
**airman first class** *noun*
پلەداری لە هێزی ئاسمانی‌دا، لەژوور airman و لەخوار sergeant ◌ ارمن فرست کلاس
**airmanship** *noun*
شارەزای فڕۆکەوانی یا فڕۆکەگێڕی ◌ ارمنشیپ
**air marshal** *noun*
1 ئەفسەرێکی هەرە پایەبەرزی هێزی دەریایی (بریتانیا): *Air Marshal Gordon Black* - 2 sky marshal ◌ سرلشکر نیروی هوایی
**air mass** *noun*
(هەواناسی) بارستەهەوا، بارستەی هەوا ◌ تودەی هوا
**air mattress** = North American term for air bed
**air-meter** *noun*
هەواپێو ◌ هواسنج
**air mile** *noun*
مایلی ئاسمانی ◌ مایل هوایی
**airmiss** /ˈeəmɪs, US ˈerm-/ *noun*
(لە بریتانیا) نزیک‌بوونەوەی لەرادەبەدەری دوو فڕۆکە بە یەکتر ◌ نزدیک شدن بیش از حد دو هواپیما به یکدیگر
**airpistol** = air rifle
**airpilow** = air cushion
**airplane** /ˈeəpleɪn, US ˈerp-/ *noun*, North American term for aeroplane
فڕۆکە، بالافڕ: *They arrived in Belgium by airplane* ◌ هواپیما
**air plant** *noun*
1 گیا یا ڕووەکی هەوایی (ئاو و شتی تر لە هەواوە وەردەگرێ)، kalanchoe 2 epiphyte ـەکان (ب.ت. *Kalanchoe pinnata*) ◌ گیاه هوایی
**air pocket** *noun*
چاڵی ئاسمانی، بۆشایی هەوایی: *The plane hit an air pocket* ◌ فروهنج
**airport** /ˈeəpɔːt, US ˈerpɔːrt/ *noun*
فڕۆکەخانە، بالافڕگە، فڕینگە: *waiting in the airport lounge* ◌ فرودگاه
**airpost** = airmail
**air power** *noun*
هێزی ئاسمانی، هێزی هەوایی ◌ قدرت هوایی
**air pressure** *noun*
پەستان یان گوشاری هوا ◌ فشار هوا
**air pump** *noun*
پۆمپی با: *an -ump used to filter water in a fish tank* ◌ پمپ هوا
**air proof** *noun*
دژەهەوا، هەوابڕ، هەوانەکێش، هەوابەند ◌ ضد هوا
**air raid** *noun*
هێرشی ئاسمانی: *an ◊ an air-raid warning* *air-raid shelter* ◌ حملەی هوایی
**air rifle** = airgun
**air sac** = alveolus
**airscrew** *noun*
پەروانەی propeller فڕۆکە ◌ ملخ هواپیما
**air-sea rescue** *noun*
ڕزگارکردنی ئاسمان ـ دەریا، پرۆسەی ڕزگارکردنی خەڵکی نێو دەریا بە ڕێگای فڕۆکەوە: *an air-sea rescue helicopter* ◌ نجات هوا ـ دریا
**airship** /ˈeəʃɪp, US ˈerʃɪp/ *noun*
کەشتی ئاسمانی یا هەوایی، هەواکەشتی ◌ هواناو
**airshow** *noun*
پیشانگای فڕۆکە ◌ نمایشگاه هواپیما
**airsick** /ˈeəsɪk, US ˈersɪk/ *adjective*
فڕۆکەگرتوو، فڕۆکەبردوو ◌ مبتلا بە هواپیماگرفتگی
**airsickness** /ˈeəsɪknəs, US ˈersɪknəs/ *noun*
فڕۆکەگرتوویی، فڕۆکەبردوویی ◌ هواپیماگرفتگی
**airspace** /ˈeəspeɪs, US ˈers-/ *noun*
ناوچەی فڕین، بواری فڕین، ئاسمانی وڵاتێ ◌ حریم هوایی
**airspeed** /ˈeəspiːd, US ˈer-/ *noun*
خێرایی ئاسمانی یا فڕین، خێرایی هەوایی (لەگەڵ ground speed بەراوردی کە) ◌ سرعت هوایی
**air stream** /ˈeəstriːm, US ˈerstriːm/ = air flow
**airstrike** *noun*
هێرشی ئاسمانی، پەلامار یان هێرشی هەوایی ◌ حملەی هوایی
**airstrip** /ˈeəstrɪp, US ˈers-/ *noun*, also landing field
باندی نیشتنەوە، باریکەی هەستان و نیشتنەوە ◌ باند فرود
**air terminal** *noun*
فڕۆکەخانە، دواوێستگە یان تێرمیناڵی ئاسمانی ◌ پایانەی هوایی
**airtight** /ˈeətaɪt, US ˈert-/ *adjective*
1 بێ‌کون، کیپ، هەوابڕ، هەوانەکێش، مووبڕ، بێ‌بابوێر: *an -t seal* 2 بێ‌عەیب 3 بێ‌ئەملاوئەولا، یەکلاییەوەبوو، بێ‌چەندوچوون (airtightness *n*) ◌ 1 بی‌منفذ 2 بدون نقطه‌ضعف 3 قطعی
**airtime** /ˈeətaɪm, US ˈert-/ *noun*
کاتی بڵاوبوونەوە (بەرنامە) ◌ زمان پخش
**air-to-air** *adjective*
ئاسمان بۆ ئاسمان، هەوا بە هەوا، فڕۆکە بە فڕۆکە: *an air-to-air missile* ◌ هوا به هوا
**air-to-ground** *adjective*
ئاسمان بۆ زەوی: *air-to-ground weapons* ◌ هوا به زمین

**air-to-surface** = air-to-ground

**air traffic control** *noun*
کۆنترۆڵی فڕین یا نیشتنەوە ۞ کنترل پرواز یا فرود

**air traffic controller** *noun*
کۆنترۆڵوانی فڕین یان نیشتنەوە ۞ مأمور کنترل پرواز یا فرود

**airvessel** *noun*
بۆری هەناسە، هەناسەڕێ ۞ نای

**air vice-marshal** *noun*
ئەفسەرێکی هەرە پایەبەرزی هێزی ئاسمانی بریتانیا ۞ ایر وایس مارشال

**airwaves** /'eəweɪvz, US 'erw-/ *noun, pl.*
شەپۆلە رادیۆییەکان؛ شەپۆلە ئاسمانییەکان ۞ امواج رادیویی؛ امواج هوایی

**airway** /'eəweɪ, US 'erweɪ/ *noun*
1 رێگای گەیشتنی هەوا بۆ سییەکان، هەوارێ: لولەی هەوا لە کاتی تەنگەتاوی سییەکاندا 2 (کان) هەواکێش 3 ئاسمانەڕێ، ڕێ یان هێڵی ئاسمانی، هەوارێ: *British airways* 1 آیروی 2 هواکش 3 مسیر هوایی

**airworthiness** /'eəwɜːðinəs, US 'erwɜːrðinəs/ *noun*
ساز بوون یان ئامادە بوون بۆ فڕین، بۆ فڕینئامادەیی ۞ مجهز بودن برای پرواز

**airworthy** /'eəwɜːði, US 'erwɜːrði/ *adjective*
بۆفڕینئامادە، ئامادە یان ساز بۆ فڕین، باش بۆ فڕین، بێمەترسی بۆ فڕین: *an airworthy airplane* ۞ مجهز برای پرواز

**airy** /'eəri, US 'eri/ *adjective* (airier, airiest)
1 هەوایی، سەربە کەش یان ئەتمۆسفێر، atmospheric: کراو لە حەوادا، حەوایی، هەوایی: 2 هەواخۆش: *The office was light and airy* 3 ناکرداریی، دەسکرد، ناڕاستەقینە، -ry *leaps* 4 خەیاڵی، *airy romances* :illusory ,unreal ئالۆری، بێخەم، کەمتەرخەم، نادەربەست، بێخەیاڵ 5 نابەڕاست، سەرسەرەکی، درۆ، هیچ، فشە 6 پروپووچ، خەیاڵی 7 کونی هەیە: *airy lacework* ۞ 1 هوایی 2 خوش‌هوا 3 تصنعی 4 بی‌خیال 5 غیرجدی 6 واهی 7 دارای سوراخ

**airy-fairy** *adjective*
1 بێبنەما، ناکرداری، ناکردەنی، ناڕاستەقینە، هیچ، پروپووچ، فشە 2 ناروون، نادیار، تەماوی ۞ 1 غیرعملی، غیرواقعی، واهی 2 غیرواضح

**aisle** /aɪl/ *noun*
1 جێڕەو، ڕێڕەو (لەنێوان کورسییەکان لە کڵێسا، شانۆ، شەمەندەفەر و...) 2 تەنیشت، کەنار (aisled *adj*) ۞ 1 راهرو 2 کنار

**ait** /eɪt/ *noun*, also eyot
(لە ناوی شوێندا) ناوڕوان، دوورگیچە (دوورگەی نێو چۆم یان ڕووبار، لەن (دوورگەی چکۆلەی زیخەلانی) ۞ ایت، جزیرک

**aitch** /eɪtʃ/ *noun*, also eyot
ئێیچ، ئەیچ، گۆکردنی پیتی H (بنەڕەت: لە *ache* فەرەنسی کۆن) ۞ ایچ

**aitchbone** *noun*
ئێسکی سمت، پاشەڵ یان کلۆت، گۆشتی کلۆت (گیانەوەر) ۞ ایچ‌بون

**ajar** /ə'dʒɑː(r)/ *adjective*
نیوەکراوە، درزپێدراو، قەلەشپێدراو (دەرگا و پەنجێرە) ۞ نیمه‌باز

**Ajax** *noun*, Latin, from Greek *Aias*
ئاژاکس، ئاجاکس، ئائیاکس: پاڵەوانی یۆنانی لە شەڕی ترۆیدا کە خۆکوژی کرد، چونکو زرێی Achilles درا بە Odysseus ۞ آژاکس

**ajuga** /ə'dʒuːgə/ *noun, pl.* same or ajugas
نیرە، ئاژووگا، گیایێ لە تیرەی bugle2 [توخم *Ajuga*] ۞ آژوگا

**Akali** /ə'kɑːli/ *noun, pl.* Alkalis
ئەندامی کۆمەڵێکی رامیاری شەڕکەری Sikh (بنەڕەت: لە *akālī* پەنجابی بە واتای: دواکەوتەی کەسێکی نەمر) ۞ آکالی

**Akan** /'ɑːk(ə)n/ *noun, pl.* same
1 ئاکان: ئەندامی گەلێکی دانیشتووی باشووری گانا و چەند بەشێکی دراوسێی Ivory Coast 2 زمانی ئەو گەلە، پێوەندی بە کۆمەڵی Kwa وە هەیە ۞ آکان

**akebia** /ə'kiːbɪə/ *noun*
دەوەن یان بنجێکی پیاهەڵچووی رۆژهەڵاتی ئاسیا بە گوڵی مەیلەو ئەرخەوانی [توخم *Akebia*] (لە *akebi* ژاپۆنی) ۞ نوعی بوته

**akee** = ackee

**Akela** /ɑː'keɪlə/ *noun*, also akela, *pl.* akelas
(نافە رمی) ڕێبەرێکی لاوی کۆمەڵی Cub Scout ۞ آکلا

**Akhenaton** *noun*, also Akhenaten or Akhenaton
ئەخێناتون، ئەخناتون (Amenhotep IV، لە 1357? پێش زایین مردووە)، پادشای میسر Amenhotep III، کوڕی 1375?-1357? (گۆڕانخوازی دینی کۆنی میسرییەکان) ۞ آخناتون

**akimbo** /ə'kɪmbəʊ, US -boʊ/ *adverb*, (with) arm akimbo
دەست لەسەر پشتێنە، قیافەگرتوو، دەستلەسەر کەلەکە ۞ دست به کمر

**akin** /ə'kɪn/ *adjective*
1 لێکچوو، وەکیەک، هاوشێوە: *his interests are akin to mine* 2 هاوڕەگەز، خزم، نزیک، هاوشێوە، شێوەی، وەکوو 3 سەربە ۞ 1 شبیه، مشابه 2 خویشاوند، مثل 3 وابسته

**akinesia** /ˌeɪkɪ'niːsɪə, ä-/ *noun*

نەمان یا یەک کەوتنی هێزی جوولانی خۆویستە (akinetic *adj*) ۞ اکینسیا

**Akita** /ə'ki:tə/ *noun*

سەگێکی spitz ی ڕەگەز ژاپۆنی (ناوچەیێکی باکووری ژاپۆن) ۞ آکیتا

**Akkadian** /ə'keɪdɪən, US -'kad-/ *adjective, noun*

*adj* 1 سەربە ئەکەد Akkad, Accad 2 سەربە یان پێوەندی بە گەل یان زمانی ئەکەدییەوە هەیە *n* 1 خەڵکی ئەکەد لە بابل Babylonia ی کۆن 2 زمانی نەماوی سامی ئەکەدی ۞ اکدی

**akrasia** /ə'kreɪzɪə, US ə'krasɪə/ *adjective*, also acrasia

بێ‌هێزی ویست و ئیرادە (**akratic** *adj*) ۞ اکراسیا

**akvavit** = aquavit

**al-** *prefix* variant spelling of ad- assimilated before -*l* (as in *alleviate*)

**-al** *suffix*

پاشگر: 1 (لە وشە ئینگلیسی، لاتین و یۆنانییەکان ئاوەڵناو ساز دەکا) سەربە، پێوەندیدار، پێوەندی هەیە (بە)، ـانە، ـەکی، وەکوو، وەک، ـی...: *tidal* 2 (ناو ساز دەکا ب.ت. ئەوەی کە ئاماژە بە کار، کردار یان کردەوەیێ بکا): *arrival* (بنەڕەت: واتای یەکەم لە *el-* فەرەنسی یان *alis-* لاتین؛ واتای دووهەم لە *aille-* فەرەنسی یان لە *alis-* لاتین کە وەک کۆتایی ناوێ کار دەکا) ۞ پسوند: 1 وابستە بە، مانند 2 عمل، عملیات

**Al** symb. the chemical element aluminium

**Ala.** *abbreviation* Alabaman

**á la** /'ɑ: lɑ:/ *preposition*

(فەرەنسی) بە شێوازی، بە شێوەی (بنەڕەت: لە à la mode ـەوە) ۞ بە سبک

**Alabaman** *noun, adjective, abbreviation* Ala.

*n* خەڵکی هەرێمی Alabama ی ئەمریکا، ئالاباماییadj سەربە یان پێوەندی بە ئالاباماوە هەیە، ئالابامایی ۞ آلابامایی

**alabaster** /'æləbɑ:stə(r), US -bæs-/ *noun*

1 ڕۆخام، مەرمەڕ 2 (وەک ئاوەڵناو، ویژەیی) سپی، چەرموو، مەرمەڕین (بنەڕەت: لە *alabastos*، *alabastros* یۆنانی) ۞ 1 رُخام 2 (صفت گونە) سفید

**alabastrine** *adjective*

مەرمەڕی، مەرمەڕین ۞ رخامی

**á la carte** /ˌɑ: lɑ, 'kɑ:t, US 'kɑ:rt/ *adverb, adjective*

(لە فەرەنسەوە) لە ڕووی لیستەوە، جیاجیا، ئالاکارت ۞ آلاکارت

**alacrity** /ə'lækrəti/ *noun*

کەفوکوڵ، تاوونین، جۆش‌وخرۆش، بەپەرۆشی، تامەزرۆیی، ویست، شادی و خۆشی، چابکی، هەڵسووڕی، گورج‌وگۆڵی، توندوتۆڵی: *accepted the invitation with alacrity* (بنەڕەت: لە *alacer* لاتین، لە *alacritas* "brisk") ۞ رغبت، اشتیاق، میل، نشاط، چابکی

**alacritous** *adjective*

بەپەرۆش، تامەزرۆ، شاد و خۆش ۞ مشتاق، بانشاط

**á la dérobée**

(فەرەنسی) بە دزییەوە، لە بنەوە، بە نهێنی، بە پەنامەکی ۞ زیر جُلکی

**Aladin** *noun*

عەلائەدین: قارەمانی ئەفسانەیی هەزار و یەک شەو کە چرای جادوویی magic lamp بە دەس هێنا ۞ علاءالدین

**Aladin's cave** *noun*

ئەشکەوتی عەلائەدین: شوێنێ کە پڕە لە ژمارەیێکی زۆری شتی سەرنج‌ڕاکێش و بەنرخ (لە *Arabian Nights' Entertainments*) ۞ غار علاءالدین

**á la française** *adjective*

(فەرەنسی) بە شێوە یان شێوازی فەرەنسی ۞ بە سبک یا شیوە ی زیر جُلکی

**alameda** /ˌalə'meɪdə/ *noun, pl.* alamedas

سەیرانگەی گشتی (دارەکان سێبەریان کردبێ، بنەڕەت: لە سپانیاییەوە) ۞ تفرج‌گاه عمومی

**á la mode** /ˌɑ: lɑ: 'məʊd, US 'moʊd/ *adjective, adverb*

(فەرەنسی) 1 بەپێی داب، بەگوێرەی باو یان دەستوور 2 ئامادەکراو لەگەڵ دۆڵدرمە (خۆراک) ۞ 1 مطابق مد 2 آلامد

**alanine** /'aləni:n/ *noun*

ترشەلۆکی ئێمینۆیی کە پێکهێنەرێکی زۆربەی پرۆتئینەکانە ۞ آلانین

**alar** /'eɪlə/ *adjective*

1 (گیانەوەرناسی) سەربە باڵ یان باڵەکان، باڵی، پەلی، پێوەندی بە باڵەوە هەیە 2 (توێکاری) باڵی، باڵ‌ئاسا، شێوەباڵ 3 (ڕووەکناسی) axillary (بنەڕەت: لە *alaris* لاتین، لە *ala* "باڵ") ۞ 1 (جانورشناسی) وابستە بە بال 2 (آناتومی) بال‌مانند 3 (گیاەشناسی) axillary

**alarm** /ə'lɑ:m, US ə'lɑ:rm/ *noun*

1 لوورە، زەنگی مەترسی: *a burglar/fire/smoke alarm* 2 نیشانەی مەترسی 3 ئاگادارکردنەوە، هوشیارکردنەوە 4 ترس، تۆقین، مەترسی، دڵەتەپێ، دڵەخورپە 5 سەعاتی زەنگ‌دار، چاڵمە 6 شەیپوور یان دەهۆڵی ئامادەبوون، دەهۆڵی ئامادەباش(ی) ۞ 1 آژیر 2 علامت خطر 3 اخطار، اعلام خطر 4 وحشت، بیم، هراس، دلهرە 5 ساعت شماطەدار 6 شیپور یا کوس حاضرباش

**alarm clock** *noun*

سـەعاتی زەنگی، کـاتژمێری زەنگدار
ساعت شماطه‌دار

**alarmed** /əˈlɑːmd, US əˈlɑːrmd/ *adjective*
ترساو، تۆقیو، ترسی‌لێنیشتوو ◌ وحشت‌زده
مرعوب

**alarming** /əˈlɑːmɪŋ, US əˈlɑːrm-/ *adjective*
نیگەران‌کەر، بەدڵەتەپی‌خەر. بەترس، ترسێنەر
[illegible] *an ~ing increase in crime*

**alarmingly** /əˈlɑːmɪŋli, US əˈlɑːrm-/ *adverb*
ترسێنەرانە، بە شێوەیەکی نیگەرانکەر [illegible]
[illegible] *have risen alarmingly*

**alarmism** /əˈlɑːmɪzəm, US əˈlɑːrm-/ *noun*
دەهێمەهاوارێتی، ترسێنەوە، ترسەرەیی
رعب‌آفرینی

**alarmist** /əˈlɑːmɪst, US əˈlɑːrm-/ *noun, adjective*
*n* مرۆڤی دەهێمەهاوار، ترسێنەر، ترسەرەوە
ترسەرەوە *adj* [illegible]
*n* [illegible] *adj* [illegible]

**alarum** = archaic word for alarm

**Alas.** abbreviation Alaska

**alas** /əˈlæs/ *interjection*
(وەزەیی یان بە شۆخی) [illegible]
هەی‌ڕۆ، وەیڕۆ، [illegible]
بە جەرگم: *For many people, alas, hunger*
[illegible] *is part of everyday life*

**Alaskan** noun, *adjective*
*n* خـەڵـکی هـەرێمـی ئالاسـکای ئـەمریکـا
ئالاسـکایی *adj* سـەربە یان پێوەندی بە ئالاسـکەوە
هەیە، ئالاسـکای ◌ آلاسکایی

**alate** /ˈeɪleɪt/ *adjective, noun*
*n* (ڕووەکناسی و مێرووناسی) خاوەنی بەڵ یـ
بـەش یـان زیـادەیێکی باڵئاسـا، بـەڵدار [illegible]
مێروویەکی باڵدار ◌ *n* [illegible]
باڵمانند *adj* آلات

**Alawi** *noun*, also Alawite
عەلەوی، عەلی‌باوەر (عەلی کوڕی ئەبی تالب ʿAlī
ibn Abī Ṭālib) ◌ علوی

**alb** /ælb/ *noun*
کەوای سپی (قەشە، بنەڕەت: لە *tunica* (or
لاتین "جلی سپی") *vestis) alba* ◌ آلب

**albacore** /ˈalbəkɔː/ *noun*
ئەلباکۆر، ئالبیکۆر: ماسی‌یێ، باڵی سەرسنگی
درێژە [*Thunnus alalunga*] ◌ آلباکور

**Albanian** *adjective, noun*
*adj* ئالبانیایی، سەربە یا پێوەندی بە ئالبانیاوە
هەیە *n* زمانی ئالبانی، خەڵکی ئالبانی، ئالبانیایی
◌ *adj* آلبانیایی *n* زمانی آلبانیایی، اهل آلبانیا

**albatross** /ˈælbətrɒs, US -trɔːs, -trɑːs/ *noun, pl.* albatrosses
1 ئالباتراس، ئالباتروس: جـۆری باڵـندەی دەریایی کە لە ئۆقیانووسەکانی باشوور و گەورە Pacific ئـەژی [توخمـەکـانی *Diomedea* و *Phoebetria*] 2 کێشەنەرەوە، مـلۆزم، مـزاحیم، مایـەی سەرێشە (بنـەڕەت: لـە *al-ghaṭṭās* عـەرەبی‌یـەوە "the diver") ◌ 1 آلـباتروس 2 اسباب مزاحمت

**albeit** /ˌɔːlˈbiːɪt/ *conjunction*
گەرچی، هەرچەن کە، لەگەڵ ئەوەش، سـەرەڕای ئەوەش: *He finally agreed, ~it reluctantly, to help us* ◌ مع‌هذا، هرچند که، با این همه

**albert (chain)** *noun*
زنجیر یان زریزەی سـەعاتی گیرفانی (بنەڕەت: لە نـاوی شـازادە یـان مـیر *Albert* (1819–61)، هاوسەری شاژن Victoria ◌ زنجیر ساعت جیبی

**Albigenses** /ˌalbɪˈgɛnsiːz, -ˈdʒɛn-/ *noun, pl.*
ئەندامانی تیرەیێکی دینی جیاباوەڕی باشووری فەرەنسە لە سەدەکانی دوازدە و سێزدە (بنەرەت: لە لاتینی سەدەکانی ناوەڕاست، لە *Albiga* ناوی لاتینی *Albi* لە باشووری فەرەنسە) ◌ آلبیجنسیز

**albinism** /ˈælbɪnɪzəm/ *noun*
زاڵی، کەوری، ئەلبینیزم (*adj* **albinic** سەربە ئەلبینیزم) ◌ زالتی

**albino** /ælˈbiːnəʊ, US -ˈbaɪnoʊ/ *noun, pl.* albinos
زاڵ، کـەور، ئـەلبینۆ: گیانـەوەر یـان کـەسـێ کـە پیگمێنتی لە پێست، موو و چاوەکانی‌دا نییـە (و زۆرتر پەمەیین) ◌ آلبینو، زالتن

**Albion** /ˈalbɪən/ *noun*
(وێـژەیـی) بریتانیـا (ی گـەورە)، ئینگلتـەرە، ئینگلستان (بنەڕەت: لە لاتینەوە) ◌ انگلستان

**albite** /ˈalbʌɪt/ *noun*
کانەسپی، کانی‌یێکی سپی پرسۆدیۆم (ی سیلیکاتی ئالومینیۆم) لە دەستەی فێلدسپار ◌ البیت

**albitic** *adjective*
سەربە کانەسپی، پێوەندی بە کانەسپی‌یەوە هـەیـە ◌ وابسته به البیت

**albizzia** /alˈbɪzɪə/ *noun*
ئـەلبیزیا، داری نێونمـەک [تـوخم *Albizia*] (بنەڕەت: لە نـاوی ڕەسـەنزادەی ئیتالیـایی‌یەوە Filippo delgi *Albizzi*) ◌ البیزیا

**album** /ˈælbəm/ *noun*
1 ئالبۆم، وێنەدان، جێ‌وێنە، جێ‌پووڵ، پووڵدان: *a photo album* 2 ئالبۆمی موسیقا (بە چەندین پارچە موسیقاوە، لەسەر سی‌دی CD، کاسێت یان ئینتێرنێت): *the band's latest album* ◌ 1 آلبوم (عکس) 2 آلبوم موسیقی

**albumen** /ˈælbjumɪn, US ælˈbjuːmən/ *noun*

1 سـپێنی (هێلکـە)، چـەرمگ 2 مـاک یـان مادەیێکی خۆراکی دەوروپشتی گیاچک embryo لە توو یان دەنکدا 3 = albumin ◌ آلبومن

**albumin** /'albjʊmɪn/ *noun*

(زینـدەکیمیـا) ئـالبۆمین: جـۆری پـرۆتینی ئاوەتوواو water-soluble، بە گەرما دەمەیێ heat-coagulable لـە پلازمـا یـان سـیرۆمی خوێن، ماسوولکە، سپێنەی هێلکە، شیر و ماک و مـادەی گیانـەوەری تـر و لـە زۆر شـلە fluid و شانەی tissue رووەک و گیاوگژدا دۆزراوەتەوە ◌ آلبومین

**albumin-globulin ratio** *noun*

ڕێژەی ئـالبۆمین-گلۆبیـولین: ڕێژە یـان ڕادەی خەستی ئالبۆمین و گلۆبۆلین لە سیرۆمی خوێندا ◌ نسبت آلبومین-گلوبولین

**albuminoid** *adjective*

ئـالبۆمینی، ئـالبۆمین‌ئاسا، شـێوەئالبۆمین: ئـەو پرۆتێنە شێوەڕیشاڵی‌یانە کە ئەرکی پاراستن و ڕاگرتنی شانەکانیان لە لەشدا لەسەرە. ئەو پرۆتێنانە بریتین لە کۆلاژێنەکان collagen لە پێستدا، ئیلاستین elastin لە ئێسکبەندەکان و کراتین لە شاخدا ◌ شبیه آلبومین، آلبومینوئید

**albuminous** /al'bju:mɪnəs/ *adjective*

ئالبۆمینی، سەربە یا خاوەنی ئالبۆمین. ئالبۆمین‌ین یا ئالبۆمینی تیایە ◌ آلبومینی، حاوی ئالبومن

**albuminous cell** *noun*

خانە یان ژوورەی ئـالبۆمینی ◌ سلول یا یاختەی آلبومینی

**albuminuria** /ˌalbjʊmɪ'njʊərɪə/ *noun*

ئالبۆمینۆرا، ئالبیۆمینوریا: بوونی ئالبۆمین لەنێو میـزدا، ب.ت. وەکـوو نیـشانەی نەخۆشـی گورچیلە kidney disease ◌ آلبومینوریا

**alburnum** = sapwood

**alcahest** – alkahest

**alcaic** /al'keɪɪk/ *adjective, noun*

*adj* نووسراوە یان ئامـاژە بـە کێشێکی هۆنراوە یۆنان و رۆمی کۆن دەکا *n* (alcaics) هۆنراوە یان هەڵبەستێکی نووسراو لەسەر کێشێکی وا (لە Alcaeus *Alkaios* (دەوروبـەری 580 620 پێش‌زایین) هۆنەری لیریکی یۆنان) ◌ الکائیک

**alcaide** *noun*, also alcayde, *pl.* alcaides or alcaydes

(ب.ت. لە سپانیا و پۆرتوگال) 1 فەرماندەر یان سەرکردەی قەڵا، سەرقەڵا 2 زیندانەوان؛ بەرپرسی زیندان، بەرپرس یان سەرۆکی بەندیخانە ◌ 1 فرماندەی زندان 2 زندانبان؛ رئیس زندان

**alcalde** /al'kaldeɪ/ *adjective*

دادگـەری ئاسـایش(ـت) یـان شـارەوان لـە سپانیا(دا)، پۆرتوگـال و شـارەکانی ئـەمریکای لاتین (بنـەڕەت: لـە *al-kāḍī* عـەرەبی، بڕوانـە cadi) ◌ آلکالدی

**Alcatraz** /'ælkətræz/ *noun*, geographical name

1 ئـەلکاتراز (دوورگـەیێکی چکۆلە نزیکی سـان فرانسیسکۆ، کـە زینـدانێکی بـەناوبانگی تیایـە، پرمەترسی‌ترین زیندانی‌یەکانی وەکوو ئاڵ کاپۆن Al Capone (1947-1898) تیـا ڕادەگیرا) 2 (alcatraz) قەڵا، کۆشک، سەرا ◌ 1 الکاتراز 2 دژ، قصر

**Alcestis** *noun*, Latin, from Greek *Alkēstis*

ئالسیستیس، ئالکیستیس: ژنی Admetus کـە ئامادەبوو لەبری مێردەکەی قوربانی کرێ بەڵام لە لایەن Hercules رزگار کرا ◌ السستیس

**alchemical** /al'kemɪkl/ *adjective*, also alchemic

سـەربە کیمیاگـەری (alchemically *adv*) ◌ وابسته به کیمیاگری

**alchemilla** /ˌalkə'mɪlə/ *noun*

(ڕووەکناسـی) گیاکیمیـا؟: جـۆرێ lady's mantle یـان گیـاێکی پێوەندی‌دار، جـاران لـە بـواری پزشـکی گیـایی‌دا بـەکـاردێنرا [تـوخم *Alchemilla*] (باوەر وابوو کە ئاونگی گەڵای ئەم گیایە دەتوانی کانزا نزمەکان base metals بکا بە زێر) ◌ نوعی گیاه

**alchemist** /'ælkəmɪst/ *noun*

ئەلکیمیست، کیمیاگەر ◌ کیمیاگر

**alchemy** /'ælkəmi/ *noun, pl.* alchemies

ئەلکیمی، کیمیاگەری ◌ کیمیاگری

**alcheringa** /ˌaltʃə'rɪŋgə/ *noun*

(لـە میـسۆلۆژی هێنـدی لـە سەرەتانـشینانی ئەوستراليا) سـەردەمی زێـڕین، کـە باوباپیرانی سەرەتا خوڵقاندیان ◌ الجرنگا

**alcid** /'alsɪd/ *noun*

(باڵندەناسـی) باڵـندەیێ لـە تـیرەی auk (Alcidae) ◌ نوعی پرنده

**Alcmene** *noun*, Greek *Alkmēnē*

ئـالکمینی: دایکی هێرکۆل لە Zeus ـەوە (کە زیۆس) خۆی بە شێوەی مێردەکەی ئامفیتریۆن Amphitryon دەرهێنا ◌ آلکمنی

**alcohol** /'ælkəhɒl, US -hɔ:l, -hɑ:l/ *noun*

1 (کیمیـا) هـەر ئاوێتـەیێ کـە کۆمەڵـێکی hydroxyl ی OH تیایە، ئەلکۆل 2 ئەلکوهۆل، ئـارەق (بنـەڕەت: لـە *al-kuḥl* عـەرەبی) ◌ 1 الکل 2 مشروب

**alcoholic** /ˌælkə'hɒlɪk, US -'hɔ:l-, -'hɑ:l-/ *adjective, noun*

*adj* ئەلکۆڵدار، ئەلکۆلی *n* کەسێ کە تووشی ئەلکۆلیزم بووە (- alcoholically /-li, US ('hɔ:l-, -'hɑ:l-/ *adv*) ◌ *adj* الکل *n* الکولیک

**alcoholism** /'ælkəhɒlɪzəm, US -hɔ:l-, -hɑ:l-/ *noun*

ئەلکۆلـیزم، گـیرۆدەبـوون بـە خواردنـەوەی

ئەلکۆلی [illegible]

**alcoholic fermentation** *noun*

(کیمیا) ترشاندنی ئەلکۆلی [illegible]

**alcoholic thermometer** *noun*

(کیمیا) گەرمی‌پێوی ئەلکۆلی [illegible]

**alcoholometer** /ˌalkəhɒˈlɒmɪtə/ *noun*

ئەلکۆل‌پێو: ئامێرێ بۆ پێوانی خەستی ئەلکۆلی نێو شلەیێ [illegible]

**alcoholometry** *noun*

ئەلکۆل‌پێوی [illegible]

**alcopop** /ˈalkəʊpɒp, US -koʊpɑːp/ *noun*

ئەلکۆپاپ (خواردنەوەیەکی هەنجوو [illegible] شیرین) [illegible]

**Alcoran** *noun*

(کۆن) قورئان [illegible]

**alcove** /ˈalkəʊv, US -koʊv/ *noun*

[illegible] *al-kubba* [illegible]

**Alcyone** *noun* [illegible]

1 [illegible] **Aeolus** [illegible] 2 [illegible] **kingfish** [illegible] ئەستێرەی **Pleiades** [illegible]

**Aldebaran** *noun* Arabic *al-dabarān*, "the follower"

دوازەوە: ئەستێرەیەکی سووری [illegible] یەکەم لە کۆئەستێرەی Taurus [illegible] یان گەشترین ئەستێرەیە لە Hyades [illegible] 38 بەرامبەری تیرەی خۆرە [illegible] *dabarān* عەرەبی) [illegible]

**aldehyde** /ˈaldɪhaɪd/ *noun*

(کیمیا) ئاویتەیێکی ئەندامی کە کۆمەڵەی CHO ی تیایە ◌ الدیهید

**aldehydic** /ˌaldɪˈhɪdɪk/ *adjective*

سەربە یان پێوەندی بە ئەلدیهایدەوە هەیە ◌ وابستە بە الدیهید

**alder** /ˈɔːldə(r)/ *noun*

ئۆلدیر (دارێ کە شتێکی وەک catkin دەگرێ و لە خێزانی birch. بە گەڵای برگەبرگەوە. لە وڵاتانی باکووری ب.ت. لە زەوی تەڕ و شێدار [*Alnus glutinosa* و جۆرەکانی تر]) ◌ توسکا

**alder buckthorn** *noun*

(رووەکناسی) جۆرێ دەوەنی گەڵاوەریو، بە گەڵای ورشن و بەرێکی رەشەوە [ *Frangula alnus*] ◌ نوعی درختچە

**alderfly** *noun, pl.* alderflies

مێرووییەکی رەگ‌باڵی بۆرەلووک کە لە دەم ئاوان دەژی و پرگی ئاوی راو(کەر)ی هەیە [*Sialis* و توخمەکانی تر] ◌ نوعی حشرە

**alderman** /ˈɔːldəmən, US -dərm-/ *noun, pl.* aldermen

1 ئەندامی ئەنجومەنی قانووندانان بۆ شار، ئەندامی هەڵبژێراوی ئەنجومەنی شار (لە ئەمریکا، کەنەدا و ئەوستراڵیا)، ئەندامی ئەنجومەنی شار، گەورە ئەندامی ئەنجومەنی خۆجێیی 2 (یان *pl.* alderwoman alderwomen، ئەمریکا و ئەوستراڵیا) ئەندامی هەڵبژاردەی ئەنجومەنی شار ◌ اولدرمن

**aldicarb** /ˈaldɪkɑːb/ *noun*

جۆرێ ئافەت‌کوژی ریشەیی کشتوکاڵی $C_7H_{14}N_2O_2S$، بە تایبەت بۆ فەوتاندنی هێندێ هێندێ مێروو، کرمی نیماتود و جر و جانەوەری تر بەکاردێترێ ◌ آلدیکارب

**Aldis lamp** /ˈɔːldɪs/ *noun*

(دروشمی بازرگانی) چرا یان گڵۆپی ئالدیس: جۆرێ چرای دەستی بۆ ئاماژەدان لە Morse code بەکاردێترێ (بنەڕەت: لە ناوی داهێنەری بریتانیایی *Aldis* .Arthur C. W) ◌ لامپ آلدیس

**aldol** /ˈaldɒl/ *noun*

(کیمیا) ئالدۆل: ئاوێتەیێکی لینج لەگەڵ ئەلکۆل و چەند کۆمەڵێکی ئەلدیهاید، کانێ بە دەست دێترێ کە acetaldehyde دووپارژە بێ. جۆرێ ئەلدیهایدی بیتاـهایدرۆکسایلی بێ‌ڕەنگ، $C_4H_8O_2$، ب.ت. وەک ئاوێتەیێکی ئەندامی بەکاردێترێ ◌ آلدول

**aldopentose** *noun*

(کیمیا) ئالدۆپێنتۆز: شەکرێکی ئالدۆز کە پێنج گەردیلەی کاربۆنی تیابێ ◌ آلدوپنتوز

**aldose** *noun*

(کیمیا) ئالدۆس، ئالدۆز: شەکرێ کە لە هەر گەردیکدا molecule یەک کۆمەڵی ئەلدیهایدی aldehyde group تیایە ◌ آلدوز

**aldosterone** /alˈdɒstərəʊn/ *noun*

(زیندەکیمیا) هۆرمۆنێکی corticosteroid [$C_{21}H_{28}O_5$] کە هانی مژین یان گرتنی absorption سۆدیوم دەدا بە هۆی گورچیلەکانەوە و بەو شێوەیە هاوسەنگی ئاو و خوێی لەش میزان دەکا ◌ آلدواسترون

**aldosteronism** /ˌaldə(ʊ)ˈstɛrənɪz(ə)m/ *noun*

(پزشکی) دۆخێ کە لەودا ئالدۆستێرۆنێکی یەکجار زۆر دەردەدرێ و هاوسەنگی یان تەرازی خوێی خوێن تێکدەدا و دەبێتە هۆی چوونەسەرەوەی پالەپەستۆ یان گوشاری خوێن ◌ آلدواسترونیسم

**aldrin** /ˈɔːldrɪn/ *noun*

ئاوێتەیێکی جۆری هایدرۆکاربۆنی کلۆرینراو، جاران وەکوو مێرووکوژ بەکاردێترا (بنەڕەت: لە ناوی کیمیازانی ئەڵمانی *Alder* Kurt) ◌ آلدرین

**ale** /eɪl/ *noun*
1 ئێـل، ئەیل(= جۆرێ بیره) 2 ئەیل‌خۆران، فینیقالیکی ئینگلتەرە، ئەلمانی بنەڕەت) ◌ ایل

**aleatory** /ˈeɪlɪət(ə)ri, US ˈal-/ *adjective*, also aleatoric
خۆو شانسی، خۆوبەختی، ئەللابەختەکی، قوماری، بەختەکی: *an aleatory contract* ◌ الله بختی

**alec** /ˈalɪk/ *noun*, also aleck
(ئەوسترالیا) مرۆی گەوج ◌ آدم احمق

**alec, alek** /ˈalɪk/ = smart alec

**alecost** = costmary

**alee** /əˈliː/ *adjective, adverb*
(دەریاوانی) لاپەنای کەشتی ◌ پناهگاه کشتی

**alehouse** *noun*
مەیخانە، ئاوجۆفرۆشی، بیرەفرۆشی ◌ میکده، آبجوفروشی

**alembic** /əˈlɛmbɪk/ *noun*
پالـێونە، پالـێوک، چـۆڕەک، ئـەلئیمبیک (= دەزگایێ بۆ چۆڕاندنەوە، زوو بەکاریان دێنا، بنەڕەت: لە *alembicus* لاتینی سەدەکانی نێوەڕاست، لە *al-'anbīk* عەرەبییەوە، لە *al-* + *'anbīk* "دڵۆپاندن، چۆڕاندنەوە" (بنەڕەت: لە *ambix*، *ambik-* یۆنانی "cup") ◌ انبیق

**aleph** /ˈɑːlɛf/ *noun*
ئەلف، ئا: یەکەمین پیتی ئاوبێی عیبری، واتا: (سەری) گا، "ا" ◌ الف

**aleph-null** *noun*, also aleph-zero
ژمارەی بنەڕەتی cardinal number سەرجەم یا تێکڕای ژمارە تەواوەکان integer (کە چکۆلەترین ژمارەی بنەڕەتی ناسنووردارە) ◌ الف

**Aleppo boil** *noun*, also Aleppo button
کوانی خورما ◌ سالک

**alerce** /əˈlɜːsi/ *noun*
داری cypress، ب.ت. لە باشووری سپانیا و باکووری ئەفریکا دەبینرێ (*Tetraclinis articulata* و جۆرەکانی تر) ◌ نوعی درخت

**alert** /əˈlɜːt, US əˈlɜːrt/ *adjective*
1 گوێ‌قولاخ، وریا، چاوکراوە، زیت، وازر، هۆشیار، ئاگادار، بەئاگا، هایدار، قوت، زیرەک، بسپرا 2 ئامادەباش 3 ڕەوش یان باروودۆخی تەنگەناوی، باری نائاسایی، ئاگادارکردنەوە لە مەترسی یان کێشەیێ ◌ 1 گوش‌بزنگ، مترصد، مواظب، باخبر، مطلع، تیزهوش 2 آمادەباش 3 وضعیت فوق‌العاده، آژیر، اعلام خطر یا مشکلی

**alertly** /əˈlɜːtli, US əˈlɜːrtli/ *adverb*
گوێ‌قولاخانە ◌ به طور مترصد

**alertness** /əˈlɜːtnəs, US əˈlɜːrtnəs/ *noun*
گوێ‌قولاخی، زیتی، ئاگالێبوون، وریایی، هۆشیاری، ئاگاداری ◌ ترصد، هوشیاری، مواظبت

**-ales** *suffix*
(ڕووەکناسی) پاشگر: ناوی دەستەی order ڕووەک و گیاکان ساز دەکا (بە واتای "سەربە یان پێوەندی هەیە"): *Coniferales*، *Rosales*، *Cycadales* ◌ پسوند: اسم ردەی گیاهان را می‌سازد

**aleurone** /əˈljʊərəʊn/ *noun*, also aleurone
(ڕووەکناسی) ئاردە: جۆرێ پرۆتئین کە وەک دەنکۆڵە لە خانەکانی دەنک و دانی گیاکاندا هەڵگیراوە، ماکێکی پرۆتئینی لە شێوەی دەنکۆڵە(ی ورد) کە لە دانەکاندا لەنێو endosperm دا یان لەنێو توێیێکی ڕووەکی peripheral تایبەتیدا هەیە، پرۆتئینێ کە دەرەکیترین توێژی دان پێکدێنێ (بنەڕەت: لە *aleuron* یۆنانی "flour") ◌ آلیورون

**aleuronic** *adjective*
ئاردەیی، سەربە یان پێوەندی بە ئاردەوە هەیە ◌ وابسته به آلیورون

**Aleut** /əˈljuːt, US ˈalɪuːt/ *noun*
1 ئەندامی گەلی زۆربەدانیشتووی دوورگەکانی ئالیوت و چەند بەشێ لە ڕۆژاوای ئالاسکا 2 زمانی ئەو گەلە، پێوەندی بە ئیسکیمو هەیە ◌ آلیوت

**Aleutian** *adjective, noun*
*adj* سەربە یان پێوەندی بە دوورگەکانی ئالیوتییەوە هەیە *n* 1 Aleut 1 2 دوورگەکانی ئالیوت ◌ آلیوتی

**A level** /ˈeɪ levl/ *abbreviation* (= advanced level)
ئێی لەیڤڵ (لە بریتانیا کە لە بابەتێکی تایبەتی ئەگیرێ، زۆرتر لە کۆتایی ساڵ و لە تەمەن 18 ساڵیدا) ◌ ای لوِل

**alevin** /ˈaləvɪn/ *noun*
سەلمون یا کەشینەی trout تازە گەراخستوو ◌ آلوین

**alewife** *noun, pl.* alewives
1 ژنی بیرەفرۆش یان ئاوجۆفرۆش 2 جۆرێ ماسی باکووری ڕۆژاوای ئەتلانتیک لە تیرەی herring [*Alosa pseudoharengus*] ◌ 1 زن آبجوفروش 2 الیوایف

**alexanders** *noun, pl.*
گیایێ لە تیرەی parsley، بە گوڵی مەیلەو زەردەوە، جاران لە سالاتا بەکاردێنرا [*Smyrnium olusatrum*] ◌ نوعی گیاه

**Alexandrian** *adjective*
1 سەربە Alexandria لە میسر 2 سەربە ئەسکەندەری مەزن Alexander the Great 3 ئەسکەندەرانی: سەربە ڕیبازە ویژەیی و فەلسەفییەکانی ئەلیکساندریا یان ئەسکەندەرییەی کۆن 4 Hellenistic ◌ 1 وابسته به اسکندریه 2 وابسته به اسکندر کبیر 3 اسکندرانی

**alexandrine** /ˌalɪgˈzɑːndrɪn, -ʌɪn/ *noun*
سەربە ئەسکەندەر، ئەسکەندەری ◌ وابسته به اسکندر، اسکندری

**alexandrite** /ˌalɪgˈzɑːndrʌɪt/ *noun*
جۆرێ گەوهەر کە لە ڕۆژدا سەوز دەنوێنێ

[illegible] (بنەڕەت: لە ناوی تیزاری رووسی [illegible]
ی دووهەم + ite¹) [illegible]

**[illegible]** [illegible] *noun*

(پزشکی) جۆرێ تێکچوونە کە کەسەکە [illegible] وشە یان پیتە نووسراوەکان [illegible] لێک‌کاتەوە (بڕوانە **dyslexia**) [illegible]

**Alf** *noun*

(ئەوستراليا و نافەرمی) [illegible] نەخوێندەواری ئوسترالیایی (بنەڕەت [illegible] (*Alfred*) [illegible]

**Alfa** *noun*

ئالفا: وشەکۆدی پەیوەندی [illegible]

**[illegible]** [illegible] *noun* also lucerne, *pl.* [illegible]

وێنجە، یۆنجە، [illegible] *Medicago* [illegible] *sativa*] [illegible]

**[illegible]** = [illegible] Spanish from Arabic [illegible]

**[illegible]** [illegible] *noun*

[illegible] *Perrier* [illegible] *Alfredo* [illegible] (*Lelio*) [illegible]

**[illegible]** [illegible] US [illegible] *adjective*, *adverb*

ئەل‌فرێسکۆ، لە هەوایەکی [illegible]
در فضای باز

**algo-** *prefix*

پێشگر: ژان، [illegible] یۆنانییەوە "pain") [illegible]

**alga** *noun*, *pl* algae /'aldʒiː, US 'algiː/

قەوزە، کەزاو، کەوزەر، حەلاوی، [illegible] (algae قەوزەگەل) [illegible]

**algal** /'alg(ə)l/ *adjective*

قەوزەیی، کەزاوی، سەربە گۆوەک [illegible] جلبک

**algebra** /'ældʒɪbrə/ *noun*

(بیرکاری) ئەلجیبرا، جەبر (بنەڕەت [illegible] *al-jabr* عەرەبییەوە) ۞ جبر

**algebraic** /ˌældʒɪ'breɪɪk/ *adjective*, also algebraical

جەبری ۞ جبری

**algebraically** /ˌældʒɪ'breɪɪkli/ *adverb*

لەباری جەبرییەوە ۞ از لحاظ جبری

**algebraic equation** *noun*

هاوکێشەی جەبری ۞ معادلەی جبری

**algebraic function** *noun*

فانکشنی جەبری ۞ تابع جبری

**algebraist** *noun*

جەبری، جەبرزان ۞ جبری

**Algerian** /al'dʒɪərɪən/ *adjective*, *noun*

*adj* ئەلجەزایری *n* جەزایری، خەڵکی جەزایر یان ئەلجەزایر ۞ *adj* الجزایری *n* اهل الجزایر

**-algia** *suffix*

پاشگر: ژان، ئێش، ئازار، ئاماژە بە ژان و ئێش لە بەشێکی تایبەتی لەش‌دا: *neuralgia* (بنەڕەت: لە *algos* یۆنانی "pain") ۞ پسوند: درد

**algicide** /'aldʒɪsʌɪd, US 'algɪ-/ *noun*, also algaecide

(دەرمانی) قەوزەکوژ، کەزاوفەوتێن (algicidal *adj*) ۞ جلبک‌کش

**alginic acid** /al'dʒɪnɪk/ *noun*

(کیمیا) ترشەڵۆکی ئەلجینیک: جۆرێ carbohydrate ی وڵوڵەیی gelatinous ی لەتوانەوەنەهاتوو ($C_6H_8O_6$) کە لە زۆر seaweed قاوەییدا دۆزراوەتەوە (یان پێکهێنەرێکی دیوارەی خانەکانی قەوزە قاوەییەکانە) ۞ اسید الجینیک

**algoid** *adjective*

قەوزەئاسا، شێوەکەزاو، قەوزەیی ۞ جلبک‌مانند

**Algol** *noun*

دێو(ە): جووتە ئەستێرەیی لە کۆئەستێرەی Perseus ۞ آلگول، غول

**ALGOL** /'ælgɒl, US -gɔːl, -gɑːl/ *abbreviation* alghorithic oriented language, also Algol

(کامپیوتێر) زمانێکی ئاست‌بەرزی بەرنامەنووسی ۞ الگول

**algolagnia** /ˌalgə(ʊ)'lagnɪə/ = sadomasochism

**algological** *adjective*

سەربە قەوزەناسی، پێوەندی بە قەوزەناسییەوە هەیە ۞ جلبک‌شناختی

**algologist** *noun*

قەوزەناس ۞ جلبک‌شناس

**algology** /əl'gɒlədʒi/ *noun*

قەوزەناسی، لێکۆڵینەوەی قەوزەکان ۞ جلبک‌شناسی

**Algonquian** /al'gɒŋkwɪən, US -kɪ-/ *adjective*, *noun*, also Algonkian /-kɪən/

ئالگۆنکوایی *adj* سەربەو خێزانە زمانییە یان قسەپێکەرانی *n* 1 خێزانێکی گەورەی زمانە سوورپێستەکانی باکووری، وەکوو کری Cree، بلەک‌فووت Blackfoot و چێی‌ئێن Cheyenne 2 ئاخێوەری ئەو زمانانە 3 سەربە ئەو خێزانە زمانییە یان ئاخێوەرانی ۞ آلگونکوایی

**Algonquin** /al'gɒŋkwɪn/ *adjective*, *noun*, also Algonkin

ئالگۆنکوین *adj* سەربە ئە گەلە یان زمانەکەیان *n* 1 ئەندامی گەلی سوورپێستی ئەمریکا کە لە کەنەدا بەدرێژایی رووباری ئۆتاوا دەژین 2 زمانی ئالگۆنکوایی ئەو گەلە ۞ آلگونکوین

**algophobia** *noun*
(له) ژانترسی، له ئێشتۆقیوی ۞ دردهراسی

**algorithm** /'ælgərɪðəm/ *noun*
ئـەلگۆریتم، لۆگـاریتم (ب. ت. کـامپیوتێر) ۞ الگوریتم

**algorithmic** *adjective*
سـەربە ئەلگۆریتم، لۆگاریتمی ( algorithmically *adv*) ۞ وابسته به الگوریتم

**alhaji** /al'hadʒi/ *noun*
(له ڕۆژاوای ئەفریکا) حاجی، بۆ ژن alhaja ۞ حاجی

**Alhambra** *noun*
کۆشـکی پادشـایانی Moorish لـه Granadaی سپانیا (بنەڕەت: لە *al-hamrā* "the red house" ماڵە سوورەکە" عەرەبییەوە) ۞ قصرالحمراء

**ali-** *prefix*
پێشـگر: بـاڵ، باسـک (بنـەڕەت: لـه *ala* لاتـین "wing") ۞ پیشوند: جناح، بال

**alias** /'eɪliəs/ *noun, adverb*
*n* قەرزەنێو، ناوی خواستەمەنی، ناوی خواستراو، زڕەناو، ناوی تر: *Mick Clark, -s Sid Brown* *adv* ناسراو بە ۞ *n* اسم مستعار *adv* معروف به

**Ali Baba** *noun*
عەلی بابا: ناوی داربڕێ لە *هەزار و یەک شەودا* کـە دەچێتـە نێـو ئـەشـکەوتی چـل دزەکـە بـە بەکارهێنانی نەهێنیوشەی "کونجی" ۞ علی بابا

**alibi** /'æləbaɪ/ *noun*
1 بیانوو، بەهانە 2 ئەلیبای، شوێنێکی تر، نەبوون لە شوێنی ڕوودانی تاواندا (بەڵگە و شـایەتەکان بۆ سەلماندنی نەبوونی کەسێ لە شوێنی ڕوودانی تاوانێکدا) 3 شـوێنێکی تـر، جێیێکی دی ۞ 1 عذر، بهانه 2 الیبای 3 جای دیگر

**alicyclic** /ˌalɪ'sʌɪklɪk, -'sɪk-/ *adjective*
سـەربـەو ئاوێتـە ئـەندامییانـەی کـە خـاوەنی تایبەتمەندی aliphatic یـان cyclic ـن (ب.ت. cyclohexane) ۞ الیسایکلیک

**alidade** /'alɪdeɪd/ *noun*
میل یان دەزگایێکی ڕوانین بۆ دیاریکردنی لا direction یان پێوانی گۆشەکان، لە ڕووپێویدا surveying بـەکاردێتێ (بنـەڕەت: لـە *al-'idāda* عەرەبییەوە) ۞ العضاده

**alien** /'eɪliən/ *noun, adjective*
1 هاوولاتی بیانی یان بێگانە 2 بیانی، دەرەکی، بێگانـە، نـاوەکی، نـامۆ، نـەناس، لاوە، غـەریب، غـەوارە: *an alien culture* 3 ناناسـایی، پەسـندنەکراو 4 جیـاواز، دژ 5 (سـەربە) بوونەوەری جیهانەکانی تر: *alien beings from outer space* (alienness *n* ;alienly *adv*) ۞ 1 تبعـەی خـارجی 2 خـارجی، بیگانـه، غریبـه 3 نامتعارف 4 متفاوت 5 (وابسته به) موجود فضایی

**alienability** /ˌeɪliənə'bɪləti/ *noun*
لە گواستنەوەهاتوویی، لەبەنێوکردنهاتوویی ۞ قابلیت انتقال

**alienable** /'eɪliənəbl/ *adjective*
(فەرمی) شیاوی بەناو کردن، لە گواستنەوەهاتوو، دەگوازرێتـەوە، بـەنێودەکرێ، رادەگـوێزرێ بـۆ خـاوەنایـەتی کـەسێکی تـر (دژی inalienable) ۞ قابل انتقال

**alienage** *noun*
بیانێتی، بێگانەیی، نامۆیی ۞ بیگانگی

**alienated** *adjective*
بیانی، بێگانە، تەنیا، لاتەریک ۞ بیگانه، منزوی

**alienation** /ˌeɪliə'neɪʃn/ *noun*
1 بیـانێتی، بێگانـەیی، نـامۆیی 2 لاتـەریکی، گۆشـەگیری، تـەنیایی 3 لـەخونامۆبوون، خۆلێگۆڕان، لەخۆبوونەوە، بێخۆیی 4 ڕاگوێـستن، بەنێوکردن، فرۆشتن 5 (دەروونناسی) شێتی ۞ 1 بیگـانگی 2 انـزوا، تنهـایی 3 ازخودبیگـانگی 4 واگذاری 5 اختلال مشاعر

**alienator** /ˌeɪlɪəneɪtə(r), nə(r)/ *noun*
بەناوکەر، فرۆشیار، ڕاگوێزەر ۞ انتقالدهنده

**alienee** /ˌeɪljə'ni, -li:ə-/ *noun*
بۆڕاگوێزراو، بەناوکراو ۞ منتقل الیه

**alienism** /ˌeɪljənɪzəm, -iənɪzəm/ *noun*
بێگانەیی، بێگانەیێتی، بیانێتی ۞ بیگانگی

**alienist** /ˌeɪljənɪst, -iənɪzəm/ *noun*, former term for psychiatrist

**aliform** /'eɪlɪfɔ:m/ *adjective*
باڵـی، باسـکی، شـێوەباڵ، بـاڵناسـا، سـاباڵ ۞ وابسته به بال، شبه بال

**alight** /ə'laɪt/ *adjective*
1 داگیرسـاو، گـڕگرتوو، هەڵـبوو 2 بریقـەدار، درەوشاوە، ڕووناک 3 خۆشـحاڵ، بەکەیف، شـاد ۞ 1 شعلەور 2 درخشان، روشن 3 بشاش

**alignment** /ə'laɪnmənt/ *noun*
1 هێڵ، ڕیز، ڕیکـە 2 ڕێکخـستن، میـزانکـردن، تەرازاندن، ڕیزاندن، ڕیزبەندی، ڕیزکردن: *the alignment of the sun, moon and earth at a particular time*، ڕێکخستن لە گروپدا (ب. ت. سیاسی)، یەکێتی، یەکگرتوویی، هاوپەیمانی ۞ 1 خط، دیف 2 تنظیم، صفبندی، اتحاد

**alike** /ə'laɪk/ *adjective, adverb*
وەکیـەک، هاوشـێوە، لێکچـوو، میناهـەڤ، وەکوویەک، وەکیەک، یەکسان، بە یەک شێوە، یەک جۆر: *Airports are all alike to me* ◊ *They tried to treat all their children alike* ◊ *Good management benefits employers and employees alike* ۞ هماننـد، ماننـد هـم، مشابه، شکل هم، به یک نحو

**aliment** /'æləment/ *noun*
خۆراک، نـان، خواردەمـەنی، رزق، ڕۆزی، زەواد، پێبژیو ۞ غذا، قوت، رزق

**alimental** /ælɪˈmentəl/ *adjective*
خۆراکی ◌ غذایی

**alimentary** /ælɪˈmentəri/ *adjective*
1 خۆراکی، خۆراکدەرانە، پەیوەندی بە خۆراکەوە هەیە 2 هەرسی ◌ 1 تغذیەای، غذایی 2 گوارشی

**alimentary canal** /ˈælɪmentəri kəˈnæl/ *noun*
کۆئەندامی هەرس، بۆری یا جۆگەی هەرس ◌ مجرا یا دستگاه گوارش

**alimentation** /ælɪmenˈteɪʃən/ *noun*
خواردن، خواردەمەنی، nutrition ◌ تغذیه

**alimony** /ˈælɪməni, US -mouni/ *noun, pl.* alimonies
نەفەقە، خەرجی، بژێو ◌ نفقه (alimonied *adj*)

**aliphatic** /ælɪˈfætɪk/ *adjective*
(کیمیا) ئالیفاتیک، جۆرێک بەرێک یوێک سەربە یان ئامازە دەکا بە کۆمەڵە ئۆرگانیکی کیمیایی کە ئەتۆمەکانی کاربۆنیان کۆمەڵە زنجیرەییەکی کراوە وەک لە alkane پێکدێنن ◌ آلیفاتیک

**aliquant** *adjective*
(دا)بەشنەکەری ناتەواو (وەک 5 بەرانبەر بە ژمارەی 16، لێی دابەش دەکرێ بەڵام پاشماوە دەمێنێتەوە) ◌ نابخش

**aliquot** /ˈælɪkwɒt/ *noun, adjective*
*n* بەشێ لە گشتێکی گەورەتر، نموونەیەک بۆ شیکردنەوەی کیمیایی پێکهاتەیی ◌ نمونه (دا)بەشکەری تەواو (وەک 5 بەرانبەر بە ژمارەی 15، لێی دابەش دەکرێ و پاشماوە نامێنێتەوە)؛ کەرتی fractional ◌ بخش‌پذیر

**alisphenoid** /ælɪˈsfiːnɔɪd/ *noun*
(توێکاری) باڵەپوازە، پەنەپوازە، ئێسکێکی کرۆژەیی باڵئاسای نێو کاسەسەر، بەشێ لە چاڵی چاو پێکدێنێ (بنەڕەت: لە لاتینی ala (sphenoid + "wing") ◌ بال‌پروانه

**aliteracy** *noun*
کەمخوێندەواری، بێ‌مەیلی سەبارەت بە خوێندنەوە ◌ الیتریسی

**aliterate** /eɪˈlɪt(ə)rət/ *adjective, noun*
*adj* کەمخوێندەوار، بێ‌مەیل سەبارەت بە خوێندنەوە *n* کەسێ کە دەتوانێ شتێ بخوێنێتەوە بەڵام کەم توخنی دەکەوێ ◌ الیتریت

**aliunde** *adverb, adjective*
لە جێ یان جێگایێکی تر، لە شوێنێکی دی، لە ژێدەر یان سەرچاوەیێکی تر ◌ از جای دیگر، از منبع دیگر

**alive** /əˈlaɪv/ *adjective*
1 زیندوو، لەژیان‌دا، نەمردوو 2 بەکەیف، بەگوڕ، بەدەماغ، بەجم‌وجۆل، هەڵسوور، چالاک، بزۆز 3 ئاگادار، بەخەبەر 4 هەڵبوو، داگیرساو، کلپەکردوو 5 پڕ (لە) ◌ 1 زنده 2 فعال، سرزنده 3 مطلع، آگاه 4 روشن 5 مملو (از)

**aliyah** /ˈalɪjə/ *noun, pl.* aliyoth /ˈalɪjəʊt/
کۆچ بەرەو ئیسرائیل (بنەڕەت: لە *ʿăliyyāh* عیبری "ascent") ◌ مهاجرت به سوی اسرائیل

**alizarin** /əˈlɪz(ə)rɪn/ *noun,* also alizarine
1 سوورنگ، ڕۆنیاس 2 ڕەنگی سوورنگ یان ڕۆنیاس $C_{14}H_8O_4$، لە ڕەگی ڕۆنیاس madder دەگیرێ (بنەڕەت: لە *al-ʿiṣāra* عەرەبییەوە) ◌ روناس

**alkahest** /ˈalkəhest/ *noun,* also alcahest
(مێژوویی) نۆژدارو، ژیناو، ئاوی ژیان یان حەیات ◌ نوش‌دارو

**alkali** /ˈælkəlaɪ/ *noun, pl.* alkalis or US also alkalies
ئەلکالای، ئەلکالی، تفت، قەڵیە، قەلیە (alkalization *n*) بنەڕەت: لە *al-ḳalī* عەرەبییەوە، لە *ḳalā* "roast, fry" ◌ قلیا

**alkalic** /alˈkalɪk/ *adjective*
(زەویناسی، بەرد یان کانێ) دەوڵەمەندتر لە سۆدیۆم یان پۆتاسیۆم لەچاو جۆری ئاسایی‌یەکەی، تا ئەندازەی ڕێژەیێکی زۆرتری لە ئەلکالی سۆدیۆم و پۆتاسیۆمی تیایە ◌ کانیک

**alkali feldspar** *noun*
(زەویناسی) فیلدسپاری تفتی یان ئەلکالی (پۆتاسیۆم و یان سۆدیۆمی زۆر تیایە) ◌ فلدسپار قلیایی

**alkali halide** *noun*
(کیمیا) هالیدی تفتی یا ئەلکالی ◌ هالید قلیایی

**alkali metal** *noun*
(کیمیا) کانزای ئەلکالی ◌ فلز قلیایی

**alkalimeter** *noun*
(کیمیا) تفتی‌پێو ◌ قلیاسنج

**alkalimetry** *noun*
(کیمیا) تفتی‌پێوی ◌ قلیاسنجی

**alkaline** /ˈælkəlaɪn/ *adjective*
(کیمیا) تفتی، تفتین، ئەلکالین ◌ قلیایی

**alkaline earth** *noun*
(کیمیا) ئۆکسادی کانزا تفتی خاکی‌یەکان: هەریەک لە کانزا کاردەرەوەکانی beryllium، magnesium، calcium، strontium، barium و radium کە کۆمەڵی IIA (2) یان لە خشتەی پیریۆدیک داگیر کردووە و ئۆکسایدە و هایدرۆکسایدەکان پێکدێنن ◌ آلکالین ارت

**alkalinity** /ˌælkəˈlɪnəti/ *noun*
(کیمیا) تفتیتی، تفتینیتی، تفتی‌بوون، ئەلکالینیتە، ئەلکالینیتی ◌ قلیایی بودن

**alkalinization** *noun*
(کیمیا) تفتاندن، تفتین، کردنە‌ئەلکالین، ئەلکالین، ئەلکالینیزاسیۆن، ئەلکالینیزەیشن ◌ قلیایی‌سازی

**alkaloid** /ˈælkəlɔɪd/ *adjective, noun*

*adj* (کیمیا) شێوەتفت، تفتئاسا، ساتفت،
ئالکالۆید، شێوەئەلکالی *n* ئالکالۆید: هەریەک لە
دەستە بەربلاوەکانی ناوێتە ئەندامییە
نایترۆژیندارەکان کە morphine، caffeine،
nicotine، quinine و strychnine تیایە و لە
نێو گیاکاندا هەیە ۞ *adj* شبەقلیا *n* آلکالوید

**alkaloidal** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە ئالکالۆیدەوە هەیە ۞
وابستە بە آلکالوید

**alkalosis** /ˌalkəˈləʊsɪs/ *noun*
(پزشکی) زۆربوونی ئەلکالی لەش، دۆخێکی
نائاسایی کە لەودا alkalinity خوێن و شانەکان
tissue روولە زۆرین ۞ آلکالوسیس

**alkalotic** *adjective*
(پزشکی) سەربە زۆربوونی ئەلکالی لەش ۞
وابستە بە آلکالوسیس

**alkane** /ˈalkeɪn/ *noun*, also paraffin
(کیمیا) ئەلکەین، ئالکان: هەریەک لەو چەند
هایدرۆکاربۆنی تێربوو؛ ب.ت.: هەریەک لەو
هایدرۆکاربۆنە زنجیرکراوانە $C_nH2_{n+2}$ (وەک
میتان، بوتان، ئیتان، پرۆپان) ۞ الکین

**alkanet** /ˈalkənɛt/ *noun*
دۆشاومژە، دانۆکەقەلا، لە تیرەی borage
[*Pentaglottis sempervirens* و جۆرەکانی تر]
(بنەڕەت: لە *al-ḥannat, al-ḥinnā* عەرەبی)
۞ شنگار

**alkene** /ˈalkiːn/ *noun*, also olefin
(کیمیا) ئەلکین: زنجیرە هایدرۆکاربۆنە
ناتێرەکان unsaturated hydrocarbons،
ئیتیلین و پرۆپین propene دەگرێتەوە ۞ الکین

**alkyd** /ˈalkɪd/ *noun*
(کیمیا) ئەلکید: کۆمەڵێکی جەوکە پۆلی ئێستەرە
پێکهێنراو یا دەسکردەکان، ب.ت. بۆ رووکەشی
پاراستن و لە رەنگدا بەکاردێتری ۞ الکید

**alkoxide** *noun*
جۆرێ خوێی تفتی یان بەیسیک، لە ئەلکۆل
بەهۆی جێگۆڕکێی هایدرۆژێنی هایدرۆکسیل
لەگەڵ کانزا دێتەبەرهەم ۞ الکوکسید

**alkoxy** *adjective*
سەربە یان RO بنەڕەتی تاکهاوهێزی
monovalent radical تیایە، لە کۆمەڵی ئالکایل
alkyl group پێکهاتووە و لەگەڵ ئۆکسیژێن
یەکی گرتووە (زۆرتر لە لێکدانا combination
بەکاردێنرێ) ۞ الکوکسی

**alkyl** /ˈalkʌɪl, US -kɪl/ *noun*
(کیمیا، وەک ناوەڵناو) ئالکایل، ئەلکیل: 1
خاوەنی کۆمەڵێکی ئەندامی تاکهاوهێز
monovalent organic بە شێوگی گشتی
$C_nH_{2n+1}$ (وەک میتیل و ئیتیل) کە لە
ئالکانێکەوە بەرهەم هاتوون (وەک میتان
methane) 2 (وەک ناو) ناوێتەیێکی یەک یا
چەند کۆمەڵی ئەلکیلی لەگەڵ کانزایی
<mercury alkyls> ۞ الکیل

**alkylation** *noun*
(کیمیا) ئەلکیلاندن، ئەلکیلین ۞ الکیلاسون

**alkylic** *adjective*
(کیمیا) سەربە یان پێوەندی بە ئەلکیلەوە هەیە
۞ وابستە بە الکیل

**alkyne** /ˈalkʌɪn/ *noun*
(کیمیا) ئەلکین، ئەلکاین $C_nH_{2n-2}$، acetylene
دەگرێتەوە ۞ الکین

**all** /ɔːl/ *adjective, adverb, pronoun*
هەموو، گشت، پاکی، تەواو، سەرتاسەر،
بەتەواوەتی، یەکسەرە، هەر یەک لە، زۆرترینی،
زۆرینەی، زۆر، یەکجار، هەمووجێی، پڕلە،
هەرچی: *All my plants have died* ◊ *All
wood tends to shrink* ۞ همه، تمام، کل، کاملاً،
هر یک از، حداکثر، همەجا، خیلی، پر از، هرچە

**all-** /ɔːl/
(لە لێکداندا) بەتەواوەتی، گشت، هەموو، تەواو:
*-all* بەرزترین پلە: *an all-inclusive price*
*powerful* ۞ پیشوند: کاملاً، کل، بالاترین درجە

**alla cappella** /kəˈpɛlə/ = a capella

**all-action** *adjective*
پڕڕووداو، رووداوێکی زۆری تیایە: *an action
movie* ۞ بسیار حادثەای

**Allah** /ˈælə/ *noun*
ئەڵلا، خودا، تەنیا خودای لای مسوڵمانەکان
(بنەڕەت: لە *ʼallʻh* عەرەبییەوە، کورتەی *al-
ʼilʻh* "خودا the god") ۞ الله

**all alone** *adverb*
بەتەنیایی، تەنیای تەنیا، تاق و تەنیا، تەنیا ۞
یکتنە، تنها

**all along** *adverb*
بەدرێژایی، سەرانسەری، هەموو کاتێ، هەمیشە،
لە سەرەتاوە (تا دوایی): *knew the truth all
along* ۞ در طول، تمام مدت

**allamanda** /ˌaləˈmandə/ *noun*
دەوەنێ یان گیایێکی پیاهەڵچووی گەرمێنان، بە
گوڵی رەنگاورەنگەوە زۆرتر زەرد یان
ئەرخەوانی [*Allamanda cathartica* و
جۆرەکانی تر] (لە ناوی سروشتخوازی
سویدییەوە Jean-Nicholas-Sébastien
*Allamand*) ۞ آلاماندا

**all-American** *adjective*
تەواو ئەمریکایی، پاکئەمریکایی،
لاپئەمریکایی ۞ کاملا امریکایی

**allanite** /ˈalənʌɪt/ *noun*
کانێکی کۆمەڵی epidote، لە سیلیکات،
ئالومینیۆم و ئاسن پێکهاتووە (بنەڕەت: لە ناوی
کانیناسی سکاتلەندی *Allan* Thomas + -
ite[1]) ۞ آلانیت

**allantoin** /əˈlæntəʊɪn/ *noun*
(زیندەکیمیا) بەرهەمێکی ئۆکسانی ... uric acid $C_4H_6N_4O_3$ وەک ... بەکاردێتری ◯ آلانتوئین

**allantois** /əˈlæntəʊɪs/ *noun, pl.* allantoides ...
پەردەی ناوڵەمەیی (زۆربەی ...) (allantoic *adj*) ◯ آلانتوئیس

**all-around** = all-round

**(the) all-clear** *noun*
نیشانەی بەسەرچوونی مەترسی ... ئاگادارکردنەوەی ...

**allegation** /ˌæləˈgeɪʃn/ *noun*
1 تاوانبارکردن، گوناهبارکردن 2 ... ◯ 1 اتهام 2 ادعا

**alleged** *adjective*
1 ئیدعاکراو ... دەوترێ: *an alleged ...* so-called ... *an alleged antique vase* ... *alleged ... incident*
گومانلێکراو ... *an alleged burglar* ... 2 متهم

**allegedly** /əˈledʒɪdli/ *adverb*
کە (وا)دەوترێ، کە ... پاڵ... *crimes allegedly committed during the war* ◯ که ادعا می‌شود

**allegiance** /əˈliːdʒəns/ *noun*
1 وەفاداری، دڵسۆزی، ... لایەنگری، ... 2 ... بەڵێن، سۆز، گفت 3 لایەنگر ... ◯ 1 وفاداری، حمایت، طرفداری 2 عهد، بیعت 3 حمی

**allegiant** /əˈliːdʒənt/ *adjective*
وەفادار، دڵسۆز، لایەنگر ◯ وفادار، طرفدار

**allegorical** /ˌæləˈgɒrɪkl, US -ˈgɔːr-, -ˈgɑːr-/ *adjective*
هێمایی، نیشانەیی، مەجازی، ... *an allegorical figure/novel*: خوازەیی (allegoricalness *n*) ◯ رمزی، تمثیلی، مجازی، نمادین

**allegorically** /ˌæləˈgɒrɪkli, US -ˈgɔːr-, -gɑːr-/ *adverb*
هێمایانە، بەشێوەیەکی هێمایی ◯ به طور نمادین

**allegorism** *noun*
ئەلیگۆریزم ◯ تمثیل‌نویسی

**allegorist** *noun*
ئەلیگۆریست ◯ تمثیل‌نویس

**allegory** /ˈæləgəri, US -gɔːri/ *noun, pl.* allegories
چیرۆکی هێمایی، هێماچیرۆک، چیرۆما (چیرۆک + هێما)، هێرۆک (هێما + چیرۆک)، هێما، نیشانە، خوازە: *a political allegory* ◯ تمثیل، داستان تمثیلی، مجاز، نماد

**allegretto** /ˌælɪˈgretəʊ/ *adjective, adverb*
کەمێ خێرا (تر) (موسیقا) ◯ آلگرتو

**allegro** /əˈlegrəʊ, US -groʊ/ *adjective, adverb, noun* (*pl.* allegros)
(موسیقا) خێرا، توند (خێراتر لە allegretto) بنەڕەت: لە ئیتالیاییەوە "lively" ◯ آلگرو

**allele** /ˈæliːl/ *noun*
(بۆماوەناسی) ئەلیل، ئەلێل، شێوەیەکتر (کورتەی allelomorph) ◯ الل

**allelic** *adjective*
سەربە ئەلیل، ئەلیلی، شێوەیەکتری، پێوەندی بە ئەلیلەوە هەیە ◯ وابسته به الل

**allelism** *noun*
ئەلیلیزم، ئەلیلیزم، شێوەیەکتری ◯ اللیسم

**alleochemical** /əˌliːləʊˈkemɪk(ə)l/ *noun*
(زیندەناسی) ماک یان مەتریالێکی کیمیایی کە لە لایەن زیندەوەر یان ئۆرگانیزمێکی زیندووەوە بەرهەم دێتریێ کە کاریگەرییەکی بەزیانی کارئەندامناسی لەسەر جۆرەکانی تر دەخاتەکار ◯ اللوکمیکال

**allelomorph** /əˈliːləʊmɔːf/ = allele

**allelomorphic** = allelic

**allelopathic** /əˌliːlə(ʊ)ˈpaθɪk/ *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە ئالیلۆپاتییەوە هەیە ◯ وابسته به اللوپاتی

**allelopathy** /ˌæliːˈlɒpəθi/ *noun*
(ژینگەناسی) بەرگیری لە هەڵدان و گەشەی رووەکێ بە هۆی کرداری ماکی ئازادبوو (toxin) لە رووەکێکی تر، پێشگیری لە گەشەی رووەکێ بە هۆی ژاراوکێ کە لە رووەکێکی لەو نزیکانە ئازاد دەبێ ◯ اللوپاتی

**alleluia** /ˌælɪˈluːjə/ = hallelujah

**allemande** /ˈalmɑːnd/ *noun*
1 سەمای ئەڵمانی باو لە سەدەی شازدەدا 2 پارچە موسیقایێ بۆ ئەو سەما و دەنسە (بنەڕەت: لە فەرەنسەوە "German (dance)") ◯ الماند

**all-embracement** *noun*
گشتگیری، سەراپاگیری، تەواوداگرتن ◯ فراگیری، احاطەی مطلق

**all-embracing** *adjective*
گشتگیر، گشتگرەوە، هەمووگر: *an all-embracing theory* ◯ فراگیر

**allen key** /ˈælən kiː/ = Allen wrench (trademark)

**allen screw** *noun*
ئالین سکریو، هاچەری شەش‌پاڵوو یان شەش‌لا (بنەڕەت: لە ناوی *Allen*، کۆمپانی بەرهەمهێنەر) ◯ آلن سکریو

**Allen wrench** *noun*

هاچەری شەش‌سووج یان شەش‌پالوو، هاچەری نێلی ۞ آچار آلن

**allergen** /'ælədʒən, US 'ælərdʒən/ *noun*
(مادە) هەستیاری‌بزوێن، پێ‌نەکەوتەهێن، هەستیاری‌هێن، ئالێرژێن (allergenic *adj*؛ allergenicity *adv*) ۞ آلرژی‌زا

**allergic** /ə'lɜːdʒɪk, US ə'lɜːrdʒɪk/ *adjective*
1 سەربە هەستیاری: *an allergic reaction/rash* 2 ئالێرژی‌دار، هەستیاری‌دار 3 دڵ‌هەڵکەوتوو، بێزار، بێزراو ۞ 1 وابسته به آلرژی 2 مبتلا به حساسیت 3 منزجر

**allergist** *noun*
پسپۆری ئالێرژی یان پێنەکەوتەیی یان هەستیاری ۞ متخصص آلرژی

**allergy** /'ælədʒi, US 'ælərdʒi/ *noun, pl.* allergies
1 ئالێرژی، هەستیاری، پێ‌نەکەوتن، پێ‌نەکەوتوویی، دڵ‌هەڵکەوتن، پێ‌نەکەوتە 2 بێزاری، بێزلێ‌هاتنەوە، قینلێ‌بوون ۞ 1 حساسیت 2 انزجار

**alleviation** /əˌliːvi'eɪʃn/ *noun*
1 کەم‌بوونەوە، سووک‌بوونەوە، دامرکان، دامران، داشکان، نیشتنەوە، هێوربوونەوە 2 مایەی دامرکان ۞ 1 تسکین، کاهش 2 مایەی تسکین

**alleviative** *adjective*
دامرکێنەر، هێورکەرەوە ۞ تسکین‌دهندە

**alley** /'æli/ *noun, pl.* alleics
1 کۆلان، کووچە 2 ڕێگا، گوزەر، جێڕەو، ڕەوگە 3 شەقام ۞ 1 کوچه 2 معبر 3 خیابان

**alley cat** *noun*
پشیلەی مالان‌گەڕ، پشیلەی کووچە و کۆلان ۞ گربه ولگرد

**alleyway** /'æliweɪ/ *noun*
کۆلان، کووچە، گوزەری تەنگ ۞ کوچه

**All Fools' Day** = April Fools' Day

**all for** *adverb*
خوازیار، لایەنگر، تالب، تەواوڕێک‌کەوتوو ۞ طرفدار، طالب

**All Hallows' Day** = All Saints' Day

**alliaceous** /ˌælɪ'eɪʃəs/ *adjective*
سیری، سیرانە، پیوازی، پیازی، بە شێوەی سیر یا پیواز ۞ سیری، پیازی

**alliance** /ə'laɪəns/ *noun*
1 یەکێتی، یەک‌گرتوویی، یەک‌کەوتوویی، ڕێک‌کەوتن، هاوپەیمانی، هەڤگرتن 2 پێوەندی، تێکەڵی، پێک‌بەستراوی، پێک‌بەندی، نزیکایەتی، خزمایەتی ۞ 1 اتحاد، اتفاق، پیمان 2 رابطه، پیوستگی، قرابت

**allicin** /'ælɪsɪn/ *noun*
(کیمیا) سیرین، ئەلیسین، ئالیسین: شلەیێکی چەوری تیژ $C_6H_{10}OS_2$، بە تایبەتمەندی دژەبەکتریایەوە و لە سیردا هەیە (بنەڕەت: لە لاتین *allium* "سیر" + -in[1]) ۞ الیسین

**allied** /'ælaɪd, US ə'laɪd/ *adjective*
1 یەک‌گرتوو، هاوپەیمان، یەک‌کەوتوو، ڕێک‌کەوتوو، هەڤگرتی 2 پێکبەستراو، پێکبەند، پێوەندیدار 3 سەربە هاوپەیمانان Allies ۞ 1 متحد، متفق 2 مربوط، وابسته 3 وابسته به متفقین

**the Allies** *noun*
هاوپەیمانان: 1 (لە شەڕی جیهانی یەکەم) کۆمەڵێ لەو وڵاتانەی کە بە دژی ئەڵمان، ئوتریش‌ـهەنگاری، تورکیە و بولگاریا بە شەڕ هاتن کە بریتی بوون لە بریتانیا، فەڕەنسە، ئیتالیا، ئەمریکا و وڵاتانی هاوبەرژەوەند 2 (لە شەڕی جیهانی دووەم) کۆمەڵێ لەو وڵاتانەی کە بە دژی ئەڵمان، ئیتالیا و ژاپۆن (هێزەکانی تەوەر) بە شەڕ هاتن کە بریتانیا، فەڕەنسە، ئەمریکا، یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتانی هاوبەرژەوەند دەگرێتەوە ۞ متفقین

**alligation** *noun*
تێکەڵە، ئاوێتە ۞ آمیزه

**alligator** /'ælɪgeɪtə(r)/ *noun*
1 ئەلیگاتور، تیمساحی ئەمریکایی (لە خێزانی کرۆکۆدیل، کە لە ڕووبار و گۆمەکانی ئەمریکا و چین‌دا دەژی [توخم *Alligator*: دوو جۆرن]) 2 کەوڵ یان پێستەی ئەلیگاتور ۞ 1 آلیگاتور 2 پوست آلیگاتور

**alligator fish** *noun*
ماسی ئەلیگاتوری: جۆرێ ماسی باریک و چکۆلانەی باکووری ڕۆژاوای ئەتلانتیک [*Aspidophoroides monopterygius*] ۞ ماهی آلیگاتور

**alligator lizard** *noun*
مارمێلکی ئەلیگاتوری: جۆرێ مارمێلکی خاوی ئەمریکای باکووری و مەکسیک [توخم *Gerrhonotus*: چەندین جۆرن] ۞ مارمولک آلیگاتور

**alligator pear** = avocado

**alligator snapper** *noun*, also alligator snapping turtle
جۆرێ snapping turtle هی ئاوە شیرینەکانی دەوروبەری کەنداوی مەکسیک [*Macroclemys temminckii*] ۞ نوعی لاک‌پشت

**all-important** *adjective*
یەکجار گرنگ، essential: *an all-important question* ۞ بسیار مهم

**all-in** *adjective*
1 هەمەلایەنە، گشت‌لایەنە، گشتگیر، all-inclusive، comprehensive 2 هیلاک، ماندوو، شەکەت، کەشتەنگ، لەپێ‌کەوتوو ۞ 1 فراگیر 2 خسته

جیاپێوی، ئالۆمیتری، گەشەپێوی ◯ آلومتری

**allomorph** /ˈaləmɔːf/ *noun*

(زمانەوانی) جیامۆرفیم، ئالۆمۆرف (وەکوو لە کۆنایی کۆی /s/ لە *bats* و /z/ لە *bugs* دا) ◯ تکواژگونه

**allomorphic** *adjective*

جیامۆرفیمی، سەربە جیامۆرفیم، ئالۆمۆرفی ◯ تکواژگونه‌ای

**allonym** *noun*

ناوی خوازە ◯ اسم مستعار

**allonymous** *adjective*

خاوەنی ناوی خوازە ◯ دارای اسم مستعار

**allopath** *noun*, also allopathist

ئالۆپاتیست، کەسێ کە چارەسەری نەخۆشی ئالۆپاتی دەکا ◯ آلوپات

**allopathic** *adjective*

سەربە ئالۆپاتی یا ئالۆپاسی ◯ وابسته به آلوپاتی

**allopathy** /əˈlɒpəθi/ *noun*

چارەسەرکردنی نەخۆشی ب.ت. بە دەرمانێ کە کاریگەی دژی سەبارەت بە نیشانەکانی هەیە (زۆرتر بەدژی homeopathy) ◯ آلوپاتی

**allopatric** /ˌaləˈpatrɪk/ *adjective*

(زیندەناسی، گیانەوەر یان ڕووەکێ) ناهاوزێد، ناهاونیشتمان، جیازێد، جیاناوچە، جیابوو(م)، لەگەڵ sympatric بەراوردی کە) ◯ آلوپاتریک

**allopatry** *noun*

(زیندەناسی) ناهاوزێدی، ناهاونیشتمانی، جیازێدی، جیاناوچەیی، جیابوو(م)یی ◯ آلوپاترات

**allophane** *noun*

ئالۆفان: کانیکی ڕوونی translucent بێ‌شێوە amorphous ی چەندین ڕەنگ کە زۆرتر بە شێوەی stalactite یان توێژاڵە و لە سیلیکاتی ئالومینیۆمی ئاودار hydrous aluminum silicate پێکهاتووە ◯ آلوفان

**allophone** /ˈaləfəʊn/ *noun*

1 (دەنگناسی) جیافۆنیم، ئالۆفۆنیم، ئالۆفۆن: یەکێ لە دوو یان چەند شێوەی هەمان فۆنیم (وەک هەر دەنگێکی /t/ لە *tree stop top metal button cat* و یان *city* کە ئالۆفۆنەکانی فۆنیمی /t/ ن)، لە -allo + phoneme پێکهاتووە) 2 *Canadian*، کەسێ کە زمانی ڕەسەنی نە ئینگلیسی‌یە و نە فەرەنسی ◯ 1 واج‌گونه 2 آلوفون

**allophonic** *adjective*

(دەنگناسی) جیافۆنیمی، سەربە ئالۆفۆنیم، ئالۆفۆنی ◯ واج‌گونه‌ای

**alloploypoid** *adjective, noun*

*adj* خاوەنی زیاتر لە دوو دەستە هاپلۆیدی کرۆمۆزۆمەکان کە (لەباری پێکهاتەوە) جیاواز یا ناهاوشێوەن و لە جۆرێکی جیاواز بەرهەم هاتوون *n* خانە یان زیندەوەر organism ئالۆپۆلیپلۆیدی ◯ آلوپلی‌پلوئید

**alloployploidy** *noun*

ئالۆپۆلیپلۆیدی ◯ آلوپلی‌پلوئیدی

**all-or-none** *adjective*

هەموو یان هیچ ◯ همه یا هیچ

**all-or-none principle** *noun*, also all-or-none law

بنەمای هەموو یان هیچ، قانوونی هەموو یان هیچ: ئەم قانوونە یان بنەمایە دەڵێ کاتێ سیستەم یان دەزگایێ هان بدرێ یان بە هیچ شێوەیێ کاردانەوەی نییە یان ئەوپەڕی کاردانەوەی دەبێ ◯ اصل همه یا هیچ

**allopurinol** /ˌalə(ʊ)ˈpjʊərɪnɒl/ *noun*

دەرمانێکی پێکهێنراو $C_5H_4N_4O$ کە بەری ترشانی uric acid لە لەشدا دەگرێ و بۆ چارەسەری gout و دۆخی وا بەکاردێترێ ◯ آلوپورینول

**allosaurus** /ˌaləˈsɔːrəs/ *noun*

جیا(مار)مێلکە: دایناسۆرێکی گۆشتخۆری زۆر زلەی دووپێی گەورەی دوایی‌یەکانی سەردەمی ژوراسیک Jurassic period هی ئەمریکای باکووری [تۆخم *Antrodemus* (جاران *Allosaurus*)] (لە یۆنانی‌یەوە: *allos* "other" + *sauros* "lizard") ◯ آلوسوروس

**allosteric** /ˌaləˈstɛrɪk, -ˈstɪərɪk/ *adjective*

(زیندەکیمیا) سەربە یان ئاماژە دەکا بە گۆڕانی چالاکی هەوێنەیێ بە هۆی گۆڕانێکی خۆسازاندن کە لە لایەن گەردێکی جیاوازە دەکرێ (allosterically *adv*) ◯ آلواستریک

**allosteric effect** *noun*

کاریگەری ئالوستێریک ◯ اثر آلواستریک

**allosteric enzyme** *noun*

هەوێنە یا ئانزیمی ئالوستێریک ◯ آنزیم آلواستریک

**allosteric transition** *noun*

تێپەڕینی ئالوستێریک ◯ عبور آلواستریک

**allostery** *noun*

ئالۆستێری: توانایی یان لێهاتوویی هەوێنەیێ بۆ گۆڕان کە بتوانێ لە دۆخی چالاکەوە بۆ ناچالاک بگەڕێتەوە ◯ آلواستری

**allotoxic** *adjective*

(ئەوی‌)دیژاراوی‌کەر: ئەگەر ماک و مەتریالی دەردراوی ئەندامی جۆرێ لەسەر جۆرێکی تر کاریگەری ژاراوی‌کەری هەبێ ئەوە پێی دەڵێن (ئەوی‌)دیژاراوی‌کەر ◯ آلوتوکسیک

**allotetraploid** = amphidiploid

**allotment** /əˈlɒtmənt, US əˈlɑːt-/ *noun*

1 تەرخاندان، تایبەتی‌دان 2 دابەش‌کردن، دابەشاندن، بەشینەوە 3 بەش، پشک، پار: *the allotment of shares to company employees* ◯ 1 اختصاص، تخصیص 2 تقسیم

3 سهم

**allotriomorphism** *noun*

فرەیچمی، فرەشێوەیی، زۆریچمی، [illegible]

**allotrope** /ˈælətrəʊp, US -troʊp/ *noun*

(کیمیا) فرەیچم، فرەشێوە، [illegible] (allotropic *adj*) [illegible]

**allotropy** /əˈlɒtrəpi/ *noun*

(کیمیا) فرەشێوەیی، جیاشێوەیی، فرەیچمی دگروارى

**all-out** *adjective, adverb*

بە دڵ و گیانەوە، بە گیانەوە، بە [illegible] سەرویەرەوە، بە تەویەری [illegible] بەتەواوەتی: *all-out war* [illegible] *attack on the opposition* [illegible] *all out to win* [illegible]

**all-over** [illegible]

هەموو شوێنێ، [illegible] تەو ویوو، بەگشتی [illegible] *all over* [illegible] *book* [illegible]

بە کلی

**allowable** /əˈlaʊəbl/ *adjective*

رەوا، ڕێدراو، دەستوورپێدراو، [illegible] *allowable income tax deductions* [illegible] (allowably /əˈlaʊəbli/ *adv*) [illegible] قانونی، مجاز

**allowance** /əˈlaʊəns/ *noun*

1 برانە، مووچە، جیرە، مانگانە 2 خەرج 3 [illegible] بەش 4 ڕێدان، ڕێپێدان، [illegible] هێلان، هێشتن 5 خەرجی [illegible] گیرفانی 6 لێدەرکردن، [illegible] 1 مستمری، جیره 2 هزینه 3 سهمیه 4 [illegible] پولتوجیبی 6 تخفیف 7 مفرزی

**alloxan** /əˈlɒks(ə)n/ *noun*

(کیمیا) ئاوێتەیێکی ترشەڵۆکی $C_4H_2N_2O_4$ کە بەهۆی ئۆکسانی ترشەڵۆکی یوریکەوە بە دەست دێتێ ◌ آلوکسان

**alloy** /ˈælɔɪ/ *noun*

1 دارشتە، ئامێزەن، ئەمێزین 2 عەیار، بار، ڕێژە، ڕادە (لە *aloi* (تاو) فەرەنسی کۆن و *aloyer* فەرەنسی (کار verb)، هەردووکیان لە *aloier* *aleier* فەرەنسی کۆن "لێکدان" combine. لە *alligare* لاتین "تێکەڵکردن، لێکدان، تێکوەردان" blind) ◌ 1 آلیاژ 2 عیار، درجه

**all-powerfull** *adjective*

بەهێز، دەس‌ڕۆیشتوو، بەدەسەلات ◌ قدرتمند، متنفذ

**all-purpose** *adjective*

چەن(د)مەبەستە، هەمەکارە، چەن(د)کارە ◌ همه‌منظوره

**all right** *adjective, adverb*

قایلکەر، باش، چاک، ڕاست، دروست، بێ‌گومان، حەتمەن، تا رادەیێ باش، باشە، بەڵێ: *Is the* ◌ *Do you feel -ll right?* ◊ *coffee all right?* رضایتبخش، خوب، صحیح، نسبتاً خوب، یقیناً، بله

**all-round** *adjective, adverb*

*adj* 1 هەمەکارە، هەزارپیشە، هەمووکارزان 2 گشتگر، گشتی: *adv an all-round education* لەسەریەک، بە گشتی، لە گشت لایەکەوە ◌ *adj* 1 همه‌فن‌حریف 2 عمومی *adv* روی هم‌رفته

**all-rounder** *noun*

مرۆی هەمەکارە یان هەزارپیشە ◌ آدم همه‌فن‌حریف

**All Saints' Day** *noun*

یەکەمی نۆڤامبر (جەژنێکی دیانی‌یەکانە (کریستیەن) ◌ اول نوامبر

**allseed** *noun*

(ڕووەکناسی) گیادانە؟، گیایێکی چکۆلە بە گوڵی سپی‌یەوە، دانێکی زۆر دەگرێ [ *Radiola linoides*] ◌ نوعی گیاه

**all singing all dancing** *noun*

دوولۆکس، (لەمەردەزگایێ)خاوەنی تایبەتمەندی تکنیکی و پێشکەوتوو، کە لە ئەنجامدا دەتوانێ زۆر کاری جیاواز ڕابەڕێنێ ◌ دولوکس

**All Souls' Day** *noun*

دووەمی نۆڤامبر (جەژنێکی دیانی‌یەکانە) ◌ دوم نوامبر

**allspice** /ˈɔːlspaɪs/ *noun*

1 بیباری شیرینی وشکەوەکراو (لە هی داریکی کارائیبی) 2 بیبار یان ئاڵەتی شیرین، بیباری فەرەنگی [*Pimenta dioica*] 3 جۆرێ دار یان دەوەنی بۆنخۆشی ئەمریکای باکووری [تۆخم *Calycanthus*] ◌ 1 فلفل شیرین خشک‌شده 2 فلفل شیرین 3 السپیس

**all-star** *adjective*

پڕئەستێرە ◌ پرستاره

**all-star show** *noun*

شۆی پڕئەستێرە ◌ نمایش پرستاره

**all-terrain vehicle** = ATV

**all-time** *adjective*

بێ‌پێشینە، هەمیشەیی ◌ بی‌سابقه

**all told** *adverb*

سەرجەم، لەسەریەک، هەمەبەهەم ◌ جمعاً، بر روی هم

**all-up-weight** *noun*

قورسایی گشتی، کێشی سەرجەم یا تێکرا (فڕۆکە بە سوار، بار و سووتەمەنی‌یەوە) ◌ وزن کل

**allure** /əˈlʊə(r), US əˈlʊr/ *noun*

سەرنجڕاکێشی، تەلەسم، دڵڕفێنی، (هێزی) ڕاکێشان، هەژێنی. charm: *sexual allure* ◊ *the allure of the big city* ◌ جذابیت، گیرایی

**allurement** /ə'luəmənt, US ə'lurmənt/ *noun*
1 تـەفرەدان، تـاودان، فریـودان، هەڵـفریواندن، هەڵگیرساندن 2 خـستـەتەماحەوە ◌ 1 اغـوا 2 تطمیع

**alluring** /ə'luərɪŋ, US ə'lurɪŋ/ *adjective*
سەرنجراکێش، دڵڕفێن، فریـودەر: *an alluring smile* alluringly /ə'luərɪŋli, US ə'lurɪŋli/ *adv* ◌ جذاب، اغواگر

**allusion** /ə'lu:ʒn/ *noun*
1 ئاماژە، هێما، برێتی، مێزە: *Her poetry is full of obscure literary -ion* 2 کورتەباس، لاباس، کورتەئاماژە ◌ اشاره، 1 کنایه 2 تلمیح، تلویح

**allusive** /ə'lu:sɪv/ *adjective*
هێمایی، ئاماژەیی، ئاماژەپێکەر، ئاماژەتیابوو، ئاماژەمەند، ئاڵۆسیف، رازمەند، رەمزی: *an allusive style of writing* allusively /ə'lu:sɪvli/ *adv* allusiveness /ə'lu:sɪvnəs/ *n*: 1 کورتەباس، کورتەئاماژە 2 ئاماژە، مێزە) ◌ اشارتی، تلمیحی، تلویحی، رمزی

**alluvial** /ə'lu:viəl/ *adjective, noun*
*adj* نیشتە، نیشتوو، ئاوەڵگرتە، قوڕولیتەیی، ئاومالکی: *n alluvial soil* گڵی ئاومالکی یان نیشتوو ◌ *adj* رسوبی، آبرفتی *n* خاک آبرفتی

**alluvial fan** *noun*
باوەشێن یا پەنجەی نیشتوو یا ئاومالکی (ئەو جێگایەی خێرایی‌یەکە کوت‌وپڕ دەکەوێ، ب.ت. لە دەمی درکەندی ravine) ◌ پنجەی آبرفتی

**alluvion** /ə'l(j)u:vɪən/ *noun*
1 نیشتن؛ پێکهاتنی زەوی‌یێکی نوێ بەهۆی نیشتنی کەناری دەریا یان رووباری، زۆربوونی بەرەبەرەی زەوی‌یێ لە کەناری دەریا یا چۆمێ بەهۆی کاری ئاو 2 لافاوە، سێڵاو (بنەڕەت: لە فەرەنسی، لە *alluvio(n-)* لاتینی، لە *ad-* "بەرەو، رووەو towards" + *luere* "شتنەوە") ◌ 1 رسوب؛ آلوویون 2 سیل

**alluvium** /ə'lu:viəm/ *noun, pl.* alluvia or alluviums
ئاومالک، خشک، ئاوەڵگرتە، قوڕولیتە، زیخ و لمی نیشتوو، نیشتە، نیشتن (ب.ت. لە delta) ◌ آبرفت، شن رسوبی، رسوب

**all-wheel-drive** = North American term for four-wheel-drive

**ally** /'ælaɪ/ *noun, pl.* allies
1 (ولات) یـەکگرتـوو، هـەڤگرتـوو، یەککەوتوو، هاوپەیمان 2 پشتیوان، یار، یاوەر ◌ 1 متحد، متفق 2 حامی، یاور

**-ally** *suffix*
پاشگر: ئاوەڵکار دروست دەکا ◌ پسوند قیدساز

**allyl** /'alʌɪl, US -lɪl/ *noun*
(کیمیا، وەک ئاوەڵناو) سیریل، ئالیل: (سەربە یان ئاماژە دەکا بە) هایدرۆکاربۆن پاراونەبووی بنەڕەت $C_3H_4$- (سیر + -yl) ◌ الیل

**allylic** *adjective*
(کیمیا) سیریلی، سەربە سیریل ◌ وابسته به الیل

**Almagest** *noun*
1 (the Almagest) بەرهەمێکی بەناوبانگی یۆنانی لەمەڕ ئەستێرەوانی و بیرکاری لە لایەن پتۆلیمی یان پێتلمیوس Ptolemy ـەوە 2 هەر سپارەیێکی وا کە لە لایەن نووسەرانی سەدەکانی نیوەڕاستەوە نووسرابێ (بنەڕەت: لە *almageste* فەرەنسی کۆن و ئەویش لە عەرەبی: *al* "the" + *megistē* یۆنانی "greatest (composition)") ◌ مجسطی

**Alma Mater** /ˌælmə 'mɑ:tə(r), US 'meɪtə(r)/ *noun,* also alma matre
خوێندنگا یان زانکۆ، شوێنی خوێندن ◌ مدرسه یا دانشگاه

**almanac** /'ɔ:lmənæk, US 'æl-/ *noun,* also almanack
ئۆلمەنەک، رۆژمێر، ساڵنامە ◌ تقویم نجومی

**almandine** /'almәndi:n, US -dʌɪn/ *noun*
لەعلێکی بە رەنگی بەنەوشی کەمڕەنگ (لە ناوی *Alabanda* شارێکی کۆن لە ئاسیای بچوک کە ئەو بەردانە لەوێ دادەتاشران) ◌ الماندین

**almightiness** /ɔ:l'maɪtinəs/ *noun*
1 توانایی رەبەق 2 گەورەیی ◌ 1 قدرت مطلق 2 عظمت

**almighty** /ɔ:l'maɪti/ *adjective, noun*
*adj* 1 بەتوانا، توانا 2 خودای بەتوانا یان توانا، بەتوانای رەبەق 3 گەورە 4 بێ‌ئەندازە، لەرادەبەدەر 5 توند، سەخت *n* (the Almighty) خوداوەند، بەتوانای رەبەق ◌ *adj* 1 قدرتمند، متنفذ 2 قادر مطلق 3 عظیم 4 بی‌حدوحصر 5 شدید *n* قادر مطلق

**Almohad** /'almәhad/ *noun,* also Almohade /-heɪd/
ئەندامی بزووتنەوەیێکی مسوڵمانانی بەربەر و بەردینی کە لە سەدەی 12دا دەستیان بەسەر ئیمپراتۆری Almoravidدا گرت ◌ الموهاد

**almond** /'ɑ:mәnd/ *noun*
1 بادەم، بایەم، بەهیڤ، کاکڵە بادام، چواڵە (wild almond)، ناوکە بادام 2 درەخت یان داربادەم [*Prunus dulcis*] ئەرژەنگ، (bitter almond) وام، بادەمەتاڵە) ◌ 1 بادام، مغز بادام 2 درخت بادام

**almoner** /'ɑ:mәnә(r), US 'ælm-/ *noun*
خێراتگەیێن، خێراتبڵاوکەرەوە ◌ مددکار اجتماعی

**almond-eyed** *adjective*
چاوبادەمی ◌ چشم‌بادامی

**almond eyes** *noun, pl*
چاوی بادەمی ◌ چشم بادامی
**almond green** *noun*
رەنگی سەوزی بادەمی ◌ رنگ سبز بادامی
**almond oil** *noun*
رۆنی بادەم ◌ روغن بادام
**almond paste** *noun*
هەویری بادەم ◌ خمیر بادام
**almond tree** *noun*
داربادەم ◌ درخت بادام
**almoner** /[illegible], US ˈalm-/ *noun*
کاربەدەستی خێرات، خێرلاوکەرەوە، [illegible] خێردابەشکەر ◌ مامور خیرات
**almonry** /[illegible]/ *noun, pl* [illegible]
خێرخانە، [illegible]
**[illegible]** /[illegible]/ *noun* also [illegible]
[illegible]
**almost** /[illegible], US -moʊst/ *adverb*
نزیکەی، بە نزیکەیی ◌ تقریبا، در حدود
**alms** /[illegible]/ *noun, pl*
خێر، خێرات ◌ صدقه، خیرات
**alms-giver** *noun*
خێرکار، خێراتدەر، [illegible] صدقه‌دهنده
**alms-giving** *noun*
خێرکاری، خێراتدەری، [illegible] چاکەکاری، خێرخوازی، [illegible] صدقه‌دهی
**almshouse** /ˈɑːmzhaʊs/ *noun*
خێراتخانە، هەژارخانە، [illegible] گەداخانە، پەککەوتووخانە ◌ [illegible]
**almsman** *noun, pl* almsmem
خێرگر، خێرخۆر، خێراتگر ◌ صدقه‌گیر
**almswoman** *noun, pl* almswomem
(ژن) خێرگر، خێرخۆر، خێراتگر ◌ [illegible] صدقه‌گیر
**almug** /ˈælmʌg/ *noun*
(داری) سەندەڵ ◌ صندل
**alnico** *noun*
جۆرێ دارشتە کە ئالومینیۆم، نیکل و کۆباڵتی وەک پێکهێنەری سەرەکی تیایە (al (uminum) + ni (ckel) + co (balt)) ◌ نوعی آلیاژ
**aloe** /ˈæləʊ, US ˈæloʊ/ *noun*
1 (رووەکناسی) سەبر، شەوبار؟، سەبری زەرد، تاڵی 2 (bitter aloes یان aloes) شاری سەبراوگ، جۆرێ دەرمانی رەوانی بەهێز، لە ناوی تاڵی هێندێ جۆرێ سەبر دەگیرێ 3 (هەروەها American aloe) وشەیێکی تر بۆ century plant ◌ 1 صبر زرد 2 عصارەی صبر زرد
**aloes** /ˈæləʊz, US /ˈæloʊz/ *noun*
سەبری زەرد ◌ صبر زرد
**aloeswood** *noun*
1 (هەروەها aloe) داری عوود، داریون 2 جەوک یا ریتزینێ کە لەو دارە بەدەست دێ، لە بواری دەرمان، گولاو و هتد بەکاردیترێ ◌ 1 چوب عود 2 نوعی رزین
**aloe vera** /ˈvɪərə/ *noun*
1 ماک یا مادەیێکی ولولەیی، لە جۆرێ سەبر دەگیرێ، بۆ شتومەکی ئارایشت بەکاردیترێ 2 گیایێ کە ئەو ماکە بەردێنێ، زۆرتر لە کارائیب و ئەمریکای باشووری شین دەبێ [*Aloe vera*] ◌ آلوئە ورا
**aloft** /əˈlɒft, US əˈlɔːft/ *adverb*
1 لەحەوا، لە سەروو، لە ژوور، ژوورسەروو، بان: *She held the glass aloft* 2 لە فڕیندا 3 بەسەر دارالای کەشتی لەسەرووی پشتی کەشتی ◌ 1 بالا، بالای، از بالا 2 در پرواز 3 بر روی دکل کشتی یا بالای عرشه
**alogical** *adjective*
نالۆژیکی ◌ غیرمنطقی
**alone** /əˈləʊn, US əˈloʊn/ *adjective, adverb*
تەنیا، تەنێ، تاک و تەنیا، بێهاوتا، بێوێنە، بەتەنیایی، فەقەت: *He lives alone* ◌ تنها، بە تنهایی، فقط، بی‌مانند
**along** /əˈlɒŋ, US əˈlɔːŋ/ *adverb, preposition*
پێشەوە، پێشێ، روولەپێشێ، بەرەوپێشەوە، بەدرێژایی، بەدرێژی، لە سەرانسەری، لەگەڵ: *I was just walking along singing to myself* ◊ *They walked slowly along the road* ◊ *You'll find his office just along the corridor* ◊ *We're going for a swim. Why don't you come along?* ◌ پیش، جلو، رو بە جلو، در طول، در امتداد، با
**alongshore** *adverb*
بەدرێژی کەنار ◌ در طول ساحل
**alongside** /əˌlɒŋˈsaɪd, US əˌlɔːŋ-/ *preposition, adverb*
لەپاڵ، لەتەنیشت، لەلای، پێکەوە لەگەڵ، تەنیشت بە تەنیشت، پاڵ بە پاڵی، شان بە شان: *A police car pulled up alongside us* ◊ *Nick caught up with me and rode alongside* ◌ پهلوی، کنار، در کنار، دوشادوش
**aloo** /ˈɑːluː, US ˈaluː/ *noun*
(هیندی) پەتاتە، پەرەماسی ◌ سیب زمینی
**aloof** /əˈluːf/ *adverb, adjective*

1 دوور 2 جیا 3 ساردوسر، گۆشەگیر، لاتەریک، خۆدوورگر، دوورەپەریز ◌ 1 دور 2 سوا 3 درونگرا، نجوش

**aloofness** /ə'lu:fnəs/ *noun*

گۆشەگیری، لاتەریکی، لە خەلک پرینگانەوە، دوورەپەریزی ◌ درونگرایی، انزواطلبی

**alopecia** /ˌælə'pi:ʃə/ *noun*

تاسی، قژوەرین، موو وەرین، مووریژە، مووەرزە، سەر رووتانەوە (بنەرەت: لە *alōpekia* یۆنانی "گەرولی ریوی") ◌ طاسی، ریزش مو، داءالثعلب

**aloud** /ə'laʊd/ *adverb*

بەرز، بلیند، بە دەنگی بەرز: *She cried -ud in protest* ◌ با صدای بلند

**alow** /ə'ləʊ/ *adverb, adjective*

(کەشتی) بەرەو خواری، روولە خواری، سەربەرەوژیر ◌ رو بە پایین

**alp** *noun*

1 چیای بەرز (ب. ت. لە سویسرا و ولاتانی دراوسی) 2 (the Alps) زنجیرە چیای ئالپ (لە سویس و ولاتانی لیکنزیک) 3 (لە سویس) ناوچەیێکی بزوین و میرگەلانی بناری چیایێ ◌ 1 کوه بلند 2 و 3 آلپ

**alpaca** /æl'pækə/ *noun, pl.* same or alpacas

ئەلپاکا 1 (جۆری وشتری بیدووگی ئەمریکای باشووری [*Lama pacos*]) 2 خوری یان بەرگنی ئەلپاکا، پارچەی لەو بەرگنە ◌ آلپاکا

**alpargata** /ˌælpɑ:'gɑ:tə/ *noun*

(لە سپانیاییەوە) کەلاش، کلاش، espadrille ◌ گیوە

**alpenglow** /'ælpənɡləʊ/ *noun*

سووربەر یان زەردەپەری سەر چیاکان ◌ آلپنگلو

**alpenhorn** /'ælpənhɔ:n/ *noun,* also alphorn

ئامیریکی بایی زۆر دریژی دارین، وەکوو هۆرن لیدەدری، دەوروبەری 1.5 تا 4.3 میتر (یان 5 تا 14 پێ)، زۆرتر لە لایەن شوان و مێگەلەوانانی سویسییەوە بەکاردیتری ◌ نوعی ساز

**alpenstock** *noun*

گۆچانی شاخەوانی ◌ عصای کوەنوردی

**alpha** /'ælfə/ *noun*

1 ئالفا (A, α یەکەمین پیتی ئاوبیێی یۆنانی) 2 سەرەتا، بەرایی، دەسپیک، beginning 3 وشەکۆدێکە بۆ دەربرینی پیتی A، لە پیوەندی رادیۆییدا بەکاردیتری 4 alpha wave = 5 alpha particle ◌ 1 آلفا 2 آغاز 3 آلفا

**Alpha and Omega** *noun*

1 سەرەتا و بنەتا، دەسپیک و کۆتایی، سەر و ئاخر، سەراوان و بناوان، لە ئاوە تا ییێ 2 (خوازە) سەرتاسەر، بە تەواوی، سەرتاخوار، توخمە بنەرەتییەکان (لە لایەن کریستیەنەکانەوە وەک سەرناوی بۆ مەسیح بەکاردیتری) ◌ 1 آغاز و فرجام 2 تماماً، عناصر اساسی

**alphabet** /'ælfəbet/ *noun*

1 ئاوبێ، ئەلفوبێ، ئەلفابیت، پیتەمەنی 2 بنەماکان، سەرەتاکان (بنەرەت: لە *alphabetum* Late Latin لە *alpha* ،*bēta* یۆنانییەوە "یەکەمین دوو پیتی ئاوبیێ یۆنانی") ◌ 1 الفبا 2 مبانی، مقدمات

**alphabetical** /ˌælfə'betɪkl/ *adjective,* also alphabetic

ئاوبیێی، ئەلفوبێیی ◌ الفبایی

**alphabetally** /-kli/ *adverb*

لە روو یان بەپیی ئاوبیێ(وە)، بە ریزبەندی ئەلفوبیێوە ◌ بە ترتیب الفبا

**alphabetization** *noun*

ریکخستن بەپیی ئەلفوبیێ ◌ الفبایی کردن

**alphabet soup** *noun*

(نافەرمی) شۆرباو ئاوبیێ: تیکەلەیێکی شیواوی شتەکان (ب.ت. هی پیتە سەرەتاکانی ناوی ریکخراوەکان) ◌ الفبابت سوپ

**alpha cell** *noun,* also a cell

خانەی ئالفا، زوورەی ئەی یان ئالفا: بە خانە ئالفاکانی دورگەکانی لانگیرهانس Langerhans دەوتری ◌ سلول آلفا

**Alpha Centauri** *noun*

ئالفا(ی) سینتۆری: سیستمیکی سیانەئەستیرەیی کە پرشنگدارترین تەنی ئاسمانی لە گەلەستیرەی Centaurus ـە ◌ آلفای قنطورس

**alpha decay** *noun*

لیکهەلوەشانی ئالفا: رەوتیکی تیشکدەرەوە یان رادیۆئەکتیڤ کە لەودا پارچۆلکەیێکی ئالفا لە ناوکی گەردیلەیێ دیتەدەری ◌ واپاشی آلفا

**alphafetoprotein** /ˌælfəˌfi:təʊ'prəʊti:n/ *noun, abbreviation* AFP

(پزشکی) پرۆتینیی کە بەهۆی ئاولەمەوە بەرهەم دیتری کە لە نیو سەراو amniotic fluid و سووری خوینی دایکدا هەیە و بۆ دەسنیشانکردنی هیندی لە کیشەکانی زگماکی بەقازانجە ◌ آلفافتوپروتئین

**alpha globulin** *noun*

گلۆبولینی ئالفا: هەریەک لە گلۆبولینەکانی پلازما یان سیرۆم (بروانە beta globulin و gamma globulin) ◌ گلوبولین آلفا

**alpha helical** *adjective,* also alpha-helical

سەربە لوولپیچی ئالفا، سەربە پیچی ئالفا ◌ وابستە بە مارپیچ آلفا

**alpha helix** *noun,* also alpha-helix

لوولپیچی ئالفا، پیچی ئالفا: پیکهاتەیێکی زۆر پتەو کە لەودا زنجیرەکانی پیتیدی بە شیوەی پیچپیچ دەرهاتوون، ریکخستنی پیکهاتەیی پیچپیچی زۆر لە پرۆتینەکان کە لە تاکە زنجیرەیێکی ترشەلۆکە ئەمینۆکان پیکهاتووە کە

بەهۆی بەندەکانی هایدرۆژین سەفەگیر دەبێ ◌ ماریچ آلفا

**Alpha Hercules** *noun*
(ئەستێرەوانی) ئالفا(ی) هێرکولیز ◌ آلفای جاثی

**alpha-hydroxy acid** *noun*, also AHA
(کیمیا) ترشەلۆکی ئالفا ـ هایدرۆکسی ترشەلۆکێکی ئەندامی کە کۆمەڵی هایدرۆکسی نزیک بە کۆمەڵی ترشەلۆکی کاربۆکسیلیکی تیایە ◌ اسید آلفا ـ هیدروکسی

**alpha interferon** *noun*
ئینتێرفیرۆنی ئالفا: ئینتێرفیرۆنێ کە لە لایەن خڕۆکە سپی‌یەکانی خوێنەوە بەرهەم دێت و ڕێ لە زاوزێی ڤایرۆسی دەگرێ، زۆر سوودی خانەکان دادەمرکێنێ و کاردانەوەی بەرگری ڕێک دەخا (بڕوانە beta interferon و gamma interferon) ◌ اینترفرون آلفا

**alpha iron** *noun*
ئاسنی ئالفا: جۆرێ ئاسن کە بەرگەی تیی و گەرمی 910 پلەی سانتی‌گراد (یان 1670°F) دەگرێ ◌ آهن آلفا

**alphameric** = alphanumeric (*adj*)

**alphanumeric** /ˌælfənjuːˈmerɪk. US -nuːˈmer-/ *adjective, noun*, also alphanumerical
(کامپیوتر) *adj* ئەلفوبێیی ـ ژمارەیی *n* نیشانەی ئەلفوبێیی ـ ژمارەیی ◌ *adj* الفبایی ـ عددی *n* علامت الفبایی ـ عددی

**alpha particle** *noun*, also alpha or alpha ray
(فیزیک) پارچۆلکەی ئالفا: ناوکێکی هیلیۆم ب.ت. کاتێ لە لایەن هێندێ ماکی تیشکدەرەوە دێتەدەرێ ◌ ذرەی آلفا

**alpha privative** *noun*
پێشگری a- یان an- (یان بەرلە بزوێنی) لە یۆنانی و ئینگلیزیدا بۆ دەربڕینی نا (یان نەبوونی absence) بەکاردێت ◌ پربواتیو آلفا

**alpha radiation** *noun*
(فیزیک) تیشکدانەوەی ئالفا ◌ تابش آلفا

**alpha ray** *noun*, also alpha radiation
(فیزیک) تیشکی ئالفا، زنجیرە پارچۆلکەیێکی ئالفا ◌ پرتو آلفا

**alpha rhythm** *noun*, also alpha wave
(کارئەندامناسی) ریتم و چالاکی یان تەوژمی ئێلیکتریکی ئاسایی مێشک (کاتێ هۆشیار و ئارامە) بە لەرەی frequency 8 تا 13 خول لە هەر چرکەیەکدا (وەرگیراوی ئەلمانی Alphawellen، لە لایەن دۆزەرەکەیەوە Hans Berger (1873–1941) پزشکی ئەلمانی بەکاردێترا، بڕوانە beta rhythm) ◌ نواخت آلفا

**alpha taxonomy** *noun*
(زیندەناسی) پۆلاندنی ئالفا: بەشێ لە توێژینەوە پۆلاندنی‌یەکان کە کاری دەس‌نیشان‌کردن و ناونانی جۆرەکانە ◌ ردەبندی آلفا

**alpha test** *noun*
تاقی‌کردنەوە یان ئازمایشتی ئالفا (تاقی‌کاری‌یێکی دەزگا و سافتویرەکان کە پاش بەرهەمێکی بەردەست بۆ تاقی‌کاری بێتا دەکرێ) ◌ تست آلفا

**alpha-tocopherol** *noun*
ئالفا ـ تۆکۆفیرۆل: تۆکۆفیرۆلێ $C_{29}H_{50}O_2$ بە توانایی‌یێکی زۆری ڤیتامین ئی: ڤیتامین E ◌ آلفا ـ توکوفرول

**alpha wave** *noun*, also alpha rhythm
(پزشکی) شەپۆلی ئالفا ◌ موج آلفا

**Alpheus** *noun*, Latin, from Greek *Alpheios*
ئالفێۆس: خودای ڕووباری یۆنانی کە پەری دەریایی بە ناوی Arethusa ساز دەکا و لە ئاخردا یەک دەگرن ◌ آلفیوس

**alphorn** /ˈalphɔːn/ = alpenhorn

**alphosis** /ælˈfəʊsɪs/ *noun*, also alphos /ˈɑːlfəʊʃ/
بێ‌ڕەنگی پێست ◌ آلفوسیس

**alpine** /ˈælpaɪn/ *adjective, noun*
1 *adj* شاخاوی، شاخوداخ، کوێستان 2 (لە ناوی گیا یان گیانەوەراندا) کێوی، کێویلە، خۆرسک 3 بەرز، بڵیند (ب. ت. چیاکانی ئالپ لە ناوەندی ئەورووپادا) *n* 1 ڕووەک یان گیای کێوی، گیای خۆرسک 2 پەپوولەی ئەمریکای باکووری بە باڵی ڕەشی مەیلەوقاوەیی کە خاڵی سووری نارنجی لەسەرە [تۆخم *Erebia*] ◌ 1 *adj* 1 کوهستان 2 وحشی، خودرو 3 مرتفع *n* 1 گیاە کوهی 2 آلپین

**alpinism** /ˈælpɪnɪzəm/ *noun*
ئالپەوانی، شاخەوانی (ب.ت. چیاکانی ئالپ) ◌ کوهنوردی

**alpinist** /ˈælpɪnɪst/ *noun*
ئالپەوان، شاخەوان ◌ کوهنورد

**alprazolam** /alˈpreɪzə(ʊ)lam/ *noun*
(پزشکی) دەرمانێ $C_{17}H_{13}ClN_4$ لە دەستەی benzodiazepine، بۆ چارەسەری دڵەڕاوکێ و پەرێشانی بەکاردێ ◌ آلپرازولام

**the Alps** *noun, pl.*
چیاکانی ئالپ، شاخوداخی ئالپ ◌ کوەهای آلپ

**already** /ɔːlˈredi/ *adverb*
لە پێشان، جارێ، لەوەپێش، زووتر، پێش ئێستا، بەری نها، ئێستا، هەر ئێستا، تا ئێستاش، بەم زووانە: *'Lunch?' 'No thanks, I've already eaten.' ◊ I'm already late* ◌ قبلاً، فعلاً، هم‌اکنون، تا حالا هم، بە این زودی

**alright** /ɔːlˈraɪt/ = all right

**Alsatian** /ælˈseɪʃn/ *noun, adjective* = German shepherd

n 1 سەگگورگی، سەگورگی 2 ڕەسەن یان دانیشتووی Alsace ئەلساسی، ئالساسی، *adj* سەربە Alsace ◌ 1 سگگرگی 2آلساسی، آلساتین

**alsike** /'alsɪk/ *noun*

(ڕووەکناسی) شەودەر یان سێپەڕەی درێژ، کە بە زەبەنی شین دەبێ [*Trifolium hybridum*] ◌ آلسیک

**also** /'ɔ:lsəʊ, US 'ɔ:lsoʊ/ *adverb*

دیسان، هەروەها، ـیش، سەرەڕای ئەوەش، لەگەڵ ئەمەش ◌ هم، همچنین، نیز، گذشته از این

**also-ran** *noun*

1 (ئەسپ یان سەگ) دۆڕاو، داناو، بەزیو، دۆڕاندوو 2 مرۆی دۆڕاندوو یان سەرنەکەوتوو ◌ 1 بازنده 2 آدم بانده

**alstroemeria** /ˌalstrə'mɪərɪə/ *noun*

گیاێکی ئەمریکای باشووری کە زۆرتر لەبەر گوڵەکەی دەکرێ [تـوخم *Alstroemeria*] ◌ نوعی گیاه

**Altaic** /al'teɪɪk/ *adjective, noun*

*adj* 1 سەربە چیاکانی ئالتای ئاسیای ناوەندی 2 سەربەو خێزانە زمانانە کە بریتین لە تورکی Turkik، مۆنگۆلی، تونگوسیک Tungusic و مانچو Manchu *n* خێزانی زمانی ئالتایی ◌ آلتائیک

**altair** *noun*

(ئەستێرەوانی) ئەلتایر ◌ نسر طایر

**altar** /'ɔ:ltə(r)/ *noun*

1 مێحراب، مێراو، مێحراو، مێهراو، مێهراوە، پێش‌نوێژگە 2 کوشتنگە، قوربانیگا، جێ‌قوربانی، گۆڕیگە (بنەڕەت: ئینگلیسی کۆن، *altar* ،*alter* لەسەر بنچینەی *altar* ،*altarium* late Latin لە لاتینەوە *altus* ("high") ◌ 1 محراب 2 قربانگاه، مذبح

**altarpiece** /'ɔ:ltəpi:s, US -tərp-/ *noun*

(کلێسە) نەخشی پشتەوەی ئالتێر یان مێراو ◌ محجر محراب

**altazimuth** /al'tazɪməθ/ *noun*

ئامێرێ بۆ پێوانی گۆشە پۆیی و تانی‌یەکان ◌ آلتازیموت

**alterability** /ˌɔ:ltərə'bɪlətɪ/ *noun*

لەگۆڕانهاتوویی، بگۆڕی ◌ تغییرپذیری

**alterable** /'ɔ:ltərəbl/ *adjective*

لەگۆڕانهاتوو، بگۆڕ، دەگۆڕدرێ، لە گۆڕان دێ (alterably *adv*) ◌ تغییرپذیر

**alterant** *adjective, noun*

گۆڕێنەر، بگۆڕ، گۆڕەر ◌ تغییردهنده

**alteration** /ˌɔ:ltə'reɪʃn/ *noun*

گۆڕان، دەستکاری، چاککردن، گۆڕین، ◊ *major/minor alterations* :modification ◌ *an alteration in the baby's heartbeat* تغییر، اصلاح، تبدیل

**alterative** *adjective*

گۆڕەر، گۆڕێنەر ◌ تغییردهنده

**altercation** /ˌɔ:ltə'keɪʃn, US -tər'k-/ *noun*

کێشە، شەڕوکێشە، ململانێ، کێشمەکێش، قڕە، مشتومڕ، شەڕەقسە، دوو و سێ، مشەرعێن، زمانبازی ◌ نزاع، کشمکش، ستیزه، مجادله

**alter ago** /ˌæltər 'i:gəʊ, US ˌɔ:l-, 'i:goʊ/ *noun*

دۆست یان یاری گیانی‌گیانی ◌ دوست صمیمی

**alterity** /al'terɪti, US ɒl-/ *noun*

ئەویتریتی، دیتریتی، جیاوازی ◌ اختلاف

**alternant** /ɔ:l'tɔ:nənt, US ɒl-/ *noun, adjective*

*n* شێوەیێکی وشە یان یەکەیێکی زمانی تر *adj* یەکنایەکێ، یەکبەدوای‌یەک، بەشوێن‌یەکا ◌ *n* گونه *adj* یک در میان

**alternate** /ɔ:l'tɜ:nət, US 'ɔ:ltərnət/ *adjective, noun*

*adj* 1 یەکبەدوای‌یەک، بەشوێن‌یەکا، یەکنایەک، جارەناجار، بە نۆرە، یەک بە یەک 2 ئاڵوگۆڕ، ئالتێرنێیت (بیرکاری) 3 ئەویدی، دی *n* جێگر، بریتی، جێگرەوە ◌ *adj* 1 متناوب 2 متبادل 3 دیگر *n* بدل

**alternate angles** *noun, pl.*

گۆشە ئاڵوگۆڕەکان (بیرکاری) ◌ زاویەهای متبادل

**alternately** /ɔ:l'tɜ:nətli, US 'ɔ:ltərnətli/ *adverb*

یەکبەدوای یەک، یەکنایەکێ، بە شوێن‌یەکا، جارە نا جارێ، بە نۆرە، یەکە نا یەکێ، دەمە نا دەمێ: *He felt alternately hot and cold* ◌ به طور متناوب

**alternating** *adjective*

یەکنایەکێ، یەکبەدوای‌یەک، بەشوێن‌یەکا، بە نۆرە ◌ متناوب، یک در میان

**alternating current** *noun, abbreviation* AC

تەزوو یا تەوژمی گۆڕاو یا دوولایەنە، تەوژمی نۆرەکی ◌ جریان متناوب

**alternation** /ˌɔ:ltə'neɪʃn, US -tər'n-/ *noun*

1 بەشوێن‌یەکاهاتن، یەکبەدوای‌یەکبوون، بەدوای یەکهاتن: *the alternation of day and night* 2 گۆڕان 3 نۆرەکاری، نۆرە، نۆبە ◌ 1 تناوب 2 دگرگونی 3 نوبت

**alternation of generations** *noun, pl.*

(زیندەناسی) بەشوێن‌یەکاهاتنی بەرەکان، یەکبەدوای‌یەکبوونی بەرەکان، پشتاوپشت، بەدوای یەکهاتنی بەرەکان، گۆڕانی جۆرەکان: مودیلێکی زاوزێی هێندێ لە ڕووەکە نزمەکان و بڕبڕەداران کە گۆڕانێکی ڕێکوپێک نێوان شێوە ڕەگەزی و ناڕەگەزی‌یەکان (وەک

سەرەخەکان) یا شێوە دووخانکەکان
dioecious و مۆرزادەیییەکان
parthenogenetic (وەک هێندێ لە jellyfish
ـەکان) دەگرێتەوە ۞ تناوب نسل‌ها

**alternative** /ɔːl'tɜːnətɪv, US -'tɜːrn-/ *adjective, noun*
1 ئالتێرناتیف 2 جێگرەوە، لەباتی، بریتی، جێگر: 3 *Do you have an alternative solution?* دی، نیتر، ئیدی، ڕێگا، چارە 4 جیاواز: 5 *alternative comedy/lifestyles/values* هەڵبژاردن، سەرپشکی 6 ئیمکان، چار، ڕێگا یان چارە (یەکی‌تر) ۞ 1 تناوبی 2 بدیل، جایگزین، جانشین 3 دیگر، شق 4 متفاوت، مختلف 5 انتخاب 6 شق (دیگر)

**alternative energy** *noun*
وزەی جێگرەوە یان بریتی (بێجگەلە نەوت یان دیزیل، وەک گازی سروشتی یان کارەبا) ۞ انرژی جایگزین

**alternative fuel** *noun*
سوتەمەنی جێگرەوە یان بریتی ۞ سوخت جایگزین

**alternatively** /ɔːl'tɜːnətɪvli, US -'tɜːrn-/ *adverb*
1 یەک‌بەدوایەک، یەک‌نایەک، بەنۆبە 2 ڕێگایەکی‌تر، بەجێی‌ئەوە، چارەیەکی‌تر ئەمە کە ۞ 1 متناوباً 2 راه دیگر، به جای آن

**alternative medicine** *noun*
پزشکی نائاسایی یان نانەریتی (وەکوو پزشکی بە دەرزی، پزشکی گیایی یان ڕووەکی و هتد) ۞ پزشکی غیرسنتی

**alternator** /'ɔːltəneɪtə(r), US -tərn-/ *noun*
1 گۆڕەری تەزووی گۆڕاو، ئالتێرناتۆر 2 داینەمۆ، دینام ۞ 1 آلترناتور 2 دینام

**althorn** /'æltho:n/ *noun*
ئالتۆرن (ئامێرێکی موسیقایە، لە خێزانی saxhorn) ۞ التورن

**although** /ɔːl'ðəʊ, US ɔːl'ðoʊ/ *conjunction*
هەرچەند کە، هەرچەندە، ئەگەرچی، گەرچی، لەگەڵ ئەمەش‌دا، لەگەڵ ئەوەش، سەرەڕای ئەوەش، لەگەڵ ئەوەش‌دا: *although small, the kitchen is well designed* ۞ هر چند کە، با این که، با وجود این که، به رغم این که

**altimeter** /'æltɪmiːtə(r), US æl'tɪmətər/ *noun*
بەرزی‌پێو، بەرزایی‌پێو ۞ فرازسنج

**altimetric** *adjective*
سەربە بەرزی‌پێوی، سەربە بەرزایی‌پێوی ۞ وابسته به فرازسنجی

**altimetry** /'æl'tɪmɪtri/ *noun*
بەرزی‌پێوی، بەرزایی‌پێوی ۞ فرازسنجی

**altiplano** /ˌæltɪ'plɑːnəʊ/ *noun, pl.* altiplanos
بانووی ناوەندی ئەمریکای باشووری ۞ آلتی‌پلانو

**altitude** /'æltɪtjuːd, US -tuːd/ *noun*
بەرزایی، بەرزی، بڵیندایی، گڤاندە ۞ ارتفاع

**altitude sickness** *noun*
نەخۆشی بەرزایی یان بڵیندایی ۞ بیماری ارتفاع

**altitudinal** *adjective*
سەربە بەرزایی، بەرزایی‌یانە ۞ وابسته به ارتفاع

**Alt key** *noun*
(کامپیوتێر) کلیلی ئالت ۞ کلید آلت

**alto** /'æltəʊ, US 'æltoʊ/ *noun, pl.* altos
(موسیقا) ئالتۆ (بۆرترین بواری دەنگی پیاوان، تیژترین بواری دەنگی ژنان، بنەڕەت: لە *alto* ئیتالیایی "high (song)" *(canto)*) ۞ آلتو

**altocumulus** *noun, pl.* altocumuli
بەرزەتۆپەڵەهەور، بەرزەکۆمۆلۆس (هەورێ بە بەرزایی‌یێکی ناوەندی نێوان 2 تا 7 کیلۆمێتر یان 6,500 تا 23,000 پێ) ۞ آلتوکومولوس

**altogether** /ˌɔːltə'geðə(r)/ *adverb*
سەرجەم، تێکڕا، هەمەبەهەم، لە هەموو لایەکەوە، لەسەریەک، بەتەواوەتی: *I don't altogether agree with you* ۞ روی هم‌رفته، جمعاً، در مجموع، به‌کلی

**altogether** /ˌɔːltə'geðə(r)/ *noun,* in the altogether
ڕووت‌وقووت، تەواوڕووت ۞ کاملاً لخت

**alto-relievo** /ˌæltəʊrɪ'liːvəʊ/ = high relief (from Ital. *alto-rilievo*)

**alto-rilievo** = alto-relievo

**altostratus** *noun, pl.* altocumuli
بەرزەستراتۆس (= هەورێ بە بەرزایی‌یێکی ناوەندی نێوان 2 تا 7 کیلۆمیتر یان 6,500 تا 23,000 پێ) ۞ آلتواستراتوس

**altricial** /əl'trɪʃ(ə)l/ *adjective*
(گیانەوەرناسی، سەربە) نەوەکام، بەچکە یان تازەبووی ناتەواو، بووچکەزا، بێچووی زووبوو (بڕوانە precocial) ۞ وابسته به نوزاد ناقص

**altruism** /'æltruɪzəm/ *noun*
1 لەخۆبردوویی، گیان‌بازی، ئەویدی‌خوازی، فەداکاری، مرۆڤ‌دۆستی 2 (گیانەوەرناسی) ئەویدی‌خوازی: هەڵس‌وکەوتی گیانەوەرێ بە سوودی یەکێکی تر تا خۆی ۞ 1 ایثار، فداکاری، ازخودگذشتگی 2 دگرگرایی

**altruist** /'æltruɪst/ *noun*
لەخۆبردوو، گیان‌باز، ئەویدی‌خواز ۞ ایثارگر، نوع‌دوست

**altruistic** /ˌæltru'ɪstɪk/ *adjective*
1 لەخۆبردووانە، ئەویدی‌خوازانە: *altruistic behaviour* 2 لەخۆبردوو، گیان‌بەخت‌کەر، فەداکار، گیان‌باز ۞ 1 نوع‌دوستانه، ایثارگرانه 2

ازخودگذشته

**altruistically** /ˌæltruˈɪstɪkli/ *adverb*
لەخۆبردووانە، بەشێوەیەکی ئەویدیخوازانە ⬡ نوعدوستانە

**alula** /ˈaljʊlə/ *noun. pl.* alulae /ˈaljʊliː/ = bastard wing

**alum** /ˈæləm/ *noun*
زاخ، شاف، زاجی سپی ⬡ زاج سفید

**alumina** /əˈluːmɪnə/ *noun*
ئالومینا، ئۆکسایدی ئالومینیۆم ($Al_2O_3$) ⬡ آلومینا

**aluminium** /ˌæljəˈmɪniəm, US ˌælə-/ *noun,* US aluminum
فافۆن، ئالومینیۆم (بە ز.گ. 13، ن. Al؛ بنەڕەت: لە alumina + -ium) ⬡ آلومینیوم

**aluminium bronze** *noun*
دارشتەیێکی مس و فافۆن یان ئالومینیۆم ⬡ آمیزەی مس و آلومینیوم

**aluminum** /əˈluːmɪnəm/ = US term for aluminium

**alumna** /əˈlʌmnə/ *noun*
1 (ژن) خوێندکاری پێشوو یان جاران 2 دەرچووی کۆلێژ یان زانکۆ ⬡ 1 محصل سابق 2 فارغ‌التحصیل دانشکده یا دانشگاه

**alumnus** /əˈlʌmnəs/ *noun, fem.* alumna; *pl.* alumni /-ni/ or *fem.* alumnae /-niː/
1 (پیاو) خوێندکاری پێشوو یان جاران 2 دەرچووی کۆلێژ یان زانکۆ ⬡ 1 محصل سابق 2 فارغ‌التحصیل دانشکده یا دانشگاه

**alum root** = heuchera

**alveary** /ˈælvɪəri/ *noun, pl.* alvearies
1 کەنووی هەنگوین، پلوورە، خلێف، کوورە، هەنگدان، دووبەرە 2 کونی دەرەوەی گوێ ⬡ 1 کندوی عسل 2 سوراخ بیرونی گوش

**alveolar** /ælˈviːələ(r), US ˌælviˈəʊlə(r)/ *adjective, noun*
(دەنگناسی) *adj* 1 ئەلڤیولێر، پووکی، هاروویی (*d, s, t, n*) 2 کونکون، خانەخانە *n* ئەبزوێنە پووکییەکان ⬡ *adj* 1 لثوی 2 حفره‌حفره *n* هم‌خوان‌های لثوی

**alveolate** /ælˈviːələt/ *adjective*
کونکون، خانەخانە، بۆشبۆش، شانەهەنگوین‌ئاسا، شانەهەنگوینی: *alveolate pollen* ⬡حفره‌حفره

**alveolitis** /ˌalvɪə(ʊ)ˈlʌɪtɪs/ *noun*
هەوکردنی توورەکەی هەواییەکانی سییەکان ⬡ الویولیتیس

**alveolus** /alˈvɪələs, US ˌalvɪˈəʊləs/ *noun, pl.* alveoli /-lʌɪ, US -liː/
1 کونی ورد یان چکۆلە، کیسەهەوا، توورەکەهەوا، سیکلدانۆچکە، بۆشایی چکۆلە، بۆشیلەی توورەکە یان کیسەی هەوایی زۆر وردی سییەکان 2 *lungs* بۆشیلە، کون یان بۆشایی ددانی، کونی ئێسکی چوکلەی ددان 3 = *small* teethridge (بنەڕەت: لە لاتینەوە "*cavity*"، چکۆلێتراوی *alveus*) ⬡ 1 حفره‌ی کوچک 2 حفره‌ی دندانی

**always** /ˈɔːlweɪz/ *adverb*
هەمیشە، هەمووکاتێ، بە بەردەوامی، بێ‌وچان، دایمەودەرەم (یان دەرهەم)، بێ‌پسانەوە، بۆ ماوەیەکی درێژ، بۆ هەمیشە، تاسەر، هەتاهەتا ⬡ همواره، دائماً، تا ابد، برای همیشه

**alyssum** /ˈælɪsəm, US əˈlɪsəm/ *noun, pl.* alyssums
1 گیاهاری؟، وەردێتەی کێفی (رووەکی گوڵزەرد و سپی [تۆخمەکانی *Alyssum* و *Lobularia*: زۆر جۆرن]) 2 = sweet alyssum ⬡ قدومه

**Alzheimer's** = Alzheimer's disease

**Alzheimer's disease** /ˈaltshʌɪməz/ *noun*
نەخۆشی ئالزایمێر (لە ناوی پزشک یان دەمارناسی neurologist ئەڵمانییەوە Alois *Alzheimer* 1915 مردووە) ⬡ بیماری آلزایمر

**Am** symb. the chemical element americium

**a.m.** /ˌeɪ ˈem/ *abbreviation* ante meridiem
بەیانی، پێش‌نیوەڕۆ ⬡ پیش‌از ظهر، صبح

**A.M.** = a.m.

**AM** /ˌeɪ ˈem/ *abbreviation* amplitude modulation
ئەی‌ئێم، ئێی‌ئێم (= یەکێ لە شێوە سەرەکییەکانی بڵاوکردنەوەی دەنگ بەرێگای رادیۆوە) ⬡ ای‌ام

**amadavat** /ˈamədəvat/ = avadavat

**amah** /ˈɑːmə/ *noun*
دایەن یان کارەکەر لە ئاسیای دوور و هیند ⬡ پرستار بچه یا کلفت

**Amalekite** *noun, pl.* same or Amalekites
ئامالیکیت: ئەندامی گەلێکی کۆنی رەوەندی nomadic دانیشتووی باشووری کەنعان Canaan ⬡ آمالکیت

**amalgam** /əˈmælgəm/ *noun*
1 دارشتەی جیوە (لەگەڵ کانزایێکی تر، ب.ت. بۆ پڕکردنەوەی ددان بەکاردێتێ) 2 تێکەڵە، ئەمەڵگەم: *an amalgam of several companies and organizations* ⬡ 1 آلیاژ جیوه 2 ملغمه، آمیزه

**amalgamation** /əˌmælgəˈmeɪʃn/ *noun*
تێکخستن، تێکهەڵکێشان، تێکەڵکردن، تێکوەردان، یەکخستن، لێکدان، دارشتن، ئەمەڵگاندن ⬡ ادغام، آمیزش، ملغمه‌سازی

**amanuesis** /əˌmænjuˈensɪs/ *noun, pl.* amanuenses /-siːz/

میرزا، تووسەوان، روونووسی هەڵگر، روونووسگەر ◌ کاتب، ناسخ، منشی

**amaranth** /ˈamərænθ/ *noun*

1 گوڵی بۆیەکەڵمشتر، گوڵمەحموور، گوڵقەیفە، [illegible] (Amaranthaceae) 2 رەنگی ئەرخەوی [illegible] ◌ 1 گل تاجخروس 2 رنگ ارغوانی [illegible]

**amaranthine** /ˌaməˈrænθʌɪn/ *adjective*

1 ئەرخەوانی 2 نەژاکاو، چرچنەبوو، [illegible] نەمر، هەمیشەگەش، هەمیشەمەر، هەمیشەی ◌ 1 ارغوانی 2 پژمردنشنی 3 جاودان

**amaretti** /ˌaməˈreti/ *noun*

غورابی ئیتالیایی بە تامی بادەمەوە [illegible] بادەمی ◌ امارتی

**amaretto** /ˌaməˈretəʊ/ *noun*

لیکۆریکی ئیتالی بە تامی [illegible] بادەمی ◌ [illegible]

**amaryllis** /ˌaməˈrɪlɪs/ *noun*

ئەماریلیس: جۆری [illegible] *Amaryllis* *belladonna* (ئەمریکی [illegible]) *Hippeastrum* (ئەمریکی [illegible]) (بنەڕەت: لە لاتینی نوێ لە *Amaryllis*، لە *Amaryllis* یۆنانییەوە [illegible] لە هۆنراوەی شوانکارەیی [illegible])

**amassment** *noun*

خڕکردنەوە، کۆکردنەوە، پێکەوەنان، کەڵەکەبوون (ب. ت. بڕێکی زۆر) [illegible]

**amateur** /ˈamətə(r), US -tʃə(r)/ *noun, adjective*

*n* ئاماتور، هەوەسکار، [illegible] خۆشیکار *adj* 1 ناپیشەیی 2 [illegible] ناشی ◌ *n* آماتور *adj* 1 غیرحرفه‌ای 2 [illegible]

**amateur dramatics** *noun*

شانۆگەریی ئاماتور (بۆ خۆشی) ◌ [illegible]

**amateurish** /ˈamətərɪʃ, US -tʃə-/ *adjective*

1 تازەکارانە، ناشارەزایانە 2 خراپ [illegible] ◌ 1 ناشیانه 2 بد

**amateurishly** /ˈamətərɪʃli, US -tʃə-/ *adverb*

بەشێوەیەکی تازەکارانە، تازەکارانە ◌ [illegible] ناشیانه

**amateurism** /ˈamətərɪzəm, US -tʃə-/ *noun*

ئاماتوریزم: *New rules on amateurism allow payment for promotional work* : *He is a staunch supporter of amateurism* ◌ آماتورگرایی

**amative** /ˈamətɪv/ *adjective*

دڵدارانە، amorous (*adv* amatively /ˈamətɪvli/ : *n* amativeness /ˈamətɪvnəs/ دڵداری)

◌ عاشقانه

**amatol** /ˈamətɒl/ *noun*

ئاماتۆل (= کەرەسەیەکی تەقەمەنی بەهێز، کە لە TNT و نیتراتی ئامۆنیۆم ammonium nitrate ساز بووە) ◌ آماتول

**amatory** /ˈamətəri, US -tɔːri/ *adjective*, also amatorial

◌ *amatory adventures* : دڵدارانە، شەهوانی
عشقی، عاشقانه

**amaurosis** /ˌaməːˈrəʊsɪs/ *noun*

کوێری تەواو یان کەمێ بەبێ گۆڕانێکی بەرچاو لە چاودا، لەبەر نەخۆشی دەماری بینایی، مۆخی بڕبڕە یان مێشک ◌ آماوروسیس

**amaurotic** *adjective*

سەربە یان پێوەندی بە ئامۆرێسیسەوە هەیە، تووشبوو بە ئامۆریسیس ◌ وابسته بە آماوروسیس، مبتلا به آماوروز

**amazed** /əˈmeɪzd/ *adjective*

سەرسووڕماو، تاساو، واقوڕماو، حەپەساو، عەبەسراو ◌ حیرت‌زده

**amazement** /əˈmeɪzmənt/ *noun*

دەمداچەقان‌دن، واقوڕمان، سەرسامی، سەرسووڕمان ◌ حیرت، شگفتی

**amazing** /əˈmeɪzɪŋ/ *adjective*

astounding ، سەرسوورهێنەر، سەیر، incredible ◌ شگفت‌آور

**amazingly** /əˈmeɪzɪŋli/ *adverb*

بە سەرسووڕمانەوە ◌ به طور شگفت‌آوری

**Amazon** /ˈaməzən, US -zɑːn/ *noun*, from Latin, from Greek *Amazōn*

1 ژنێ لە هێزی شەڕکەر یان سەربازانی مێ (مێسۆلۆژی یۆنانی) 2 (amazon) ئەندامی رەگەزی شەڕکەرانی ژن، شێرەژن 3 (amazon) تووتی سەوزی کلکخڕی پان، هی ئەمریکای ناوەندی و باشووری [توخم *Amazona*] 4 (Amazon، دروشمی بازرگانی) کۆمپانییێ کە لە 1995 بۆ فرۆشی کتێب بە رێگای ئینتێرنێتەوە دامەزرا و یەکێ لە یەکەمین کۆمپانیاکان بوو کە بەم شێوەیە توانی کتێب، موسیقا، دیڤیدی و بەرهەمەکانی تری ئانلاین بە نرخی هەرزانتر لە کتێبخانەکان بفرۆشێ (بنەڕەت: بە رێگای لاتینەوە لە *Amazōn* یۆنانییەوە "بێ‌مەمک" (بنەڕەت: لە *a* "بێ" + *mazos* "مەمک")، ئاماژە بەو داستانە کە ئامازۆنەکان مەمکی لای راستیان دەبڕی تا بتوانن کەوان زیاتر و بە ئاسانی بکێشن) ◌ 1 آمازون 2 (با a) شیرزن 3 نوعی طوطی 4 آمازون

**amazon ant** *noun*

◌ [*Polyergus* میروولەی ئامازۆن [توخم مورچەی آمازون

**amazonian** *adjective*

**anagrammatization** *noun*
پاش‌وپێش‌خستن، گوێستنەوە یان شێواندنی پیتەکانی وشەیێ (بە شێوەیێ کە ئاناگرامێ پێکبێنێ) ◇ آناگراماتیزاسیون

**anal** /'eɪnl/ *adjective*
کۆمی، سەربە کۆم، کنگی، هەڵکەوتوو نزیک بە کۆم، دەوروبەری کۆم: *the anal region* (**anally** /'eɪnli/ *adv*) ◇ مقعدی، مجاور مقعد

**anal canal** *noun*
جۆگە یا کانالی کۆمی، کۆمەڕێ ◇ مجرای مقعدی

**analecta** /ˌanə'lɛktə/ *noun*
هەڵبژاردەی وێژەیی، کەشکۆل ◇ جُنگ

**analects** /'anəlɛkts/ *noun, pl.*, also analecta
هەڵبژاردەی وێژەیی، کەشکۆل ◇ جُنگ

**analeptic** *adjective, noun*
*adj* بەهێزکەر، بووژێنەرەوە، گورجێنەر، گورجکەرەوە *n* دەرمانی بووژێنەرەوە یان گورجێنەر ◇ *adj* مقوی *n* داروی مقوی

**anal fin** *noun*
(گیانەوەرناسی) باڵ یان باڵەی کۆمی، کۆمەباڵ(ـە) ◇ بالەی مقعدی

**analgesia** /ˌænəl'dʒiːziə, US -ʒə/ *noun*
(پزشکی) نەبوونی ژان، بەئێش‌نەزانی، بێ‌ژانی ◇ فقدان حس درد

**analgesic** /ˌænəl'dʒiːzɪk/ *adjective, noun*
*adj* ژانبڕ، ژانشکێن، دامرکێن *n* مەڵهەمی ژانبڕ، مەرهەمی دامرکێنەر ◇ *adj* مسکن *n* پماد مسکن

**analog** = analogue

**analogic** *adjective*, also analogical
پێوانەیی، پێوەرانە (**analogically** *adv*: لەباری پێوانەیی‌یەوە) ◇ قیاسی

**analogous** /ə'næləgəs/ *adjective*
1 هاوشێوە، لێکچوو، هاوتا، وەکیەک، هاوچەشن: *The two processes are not analogous* 2 (زیندەناسی) لە کارکردنا وەک یەک بەلام جیاواز لەباری بنەڕەتی گەشەسێنەرانە evolutionary origin، وەک باڵی مێروو و باڵندە (زۆرتر لە بەرامبەر homologous) 3 شیاوی هەڵسەنگاندن 3 هاوتەریب (**analogously** /ə'næləgəsli/ *adv*; **analogousness** /ə'næləgəsnəs/ *n*) ◇ 1 متشابه، همسان، همانند 2 قابل مقایسه 3 هم‌سنگ

**analogue** /'ænəlɒg, US -lɔːg, -lɑːg/ *adjective, noun*
*adj* (تکنیکی و فەرمی) هاوشێوە، هاوچەشن، لێکچوو، هاوتا، وەکیەک: *an analogue circuit/computer/signal* *n* شتێکی هاوشێوە یان لێکچوو: *Scientists are attempting to compare features of extinct animals with living -logues* ◇ *adj* مشابه، نظیر *n* چیز مشابه

**analogue computer** *noun*
کامپیوتێری ئانالۆگ ◇ کامپیوتر قیاسی

**analogue watch** *noun*
سەعات میلی یا ئانالۆگ (بەرامبەری سەعاتی ژمارەیی) ◇ ساعت عقربه‌ای

**analogy** /ə'nælədʒi/ *noun, pl.* analogies
1 لێکچوویی، هاوشێوەیی، وەکیەکی 2 پێک‌گرتن، هەڵسەنگاندن 3 پێوانە ◇ 1 شباهت، همانندی 2 مقایسه 3 قیاس

**analphabet** /ˌænælfə'betɪk/ *noun*
نەخوێندەوار (*adj*, *n*: **analphabetic** *adj* سەربە نەخوێندەواری *n* نەخوێندەوار، بێ‌سەواد؛ **analphabetism** *n*) ◇ امی

**analysand** /ə'nalɪsand/ *noun*
دەروونشیکار، کەسێکی خەریک psychoanalysis ◇ روانکاو

**analyser** *noun*
شیکەرەوە ◇ تجزیه‌کننده

**analysis** /ə'næləsɪs/ *noun, pl.* analyses /-siːz/
1 شیتەڵاندن، شیتەڵ‌کردن، شی‌کردنەوە، شیکاری، تاوتوێ(کردن)، لێکدانەوە: *statistical analysis* 2 بڕگاندن (ڕێزمان) 3 (بیرکاری) ئانالیز ◇ 1 تجزیه، تحلیل، فراکافت، تجزیه و تحلیل، بررسی 2 تقطیع 3 تحلیل

**analyst** /'ænəlɪst/ *noun*
1 شیکار، شی‌کەرەوە، لێکدەرەوە: *a political/food analyst* 2 دەروونشیکار، psychoanalyst ◇ 1 تحلیل‌گر 2 روانکاو

**analytic** /ˌænə'lɪtɪk/ *adjective*, also analytical /ˌænə'lɪtɪkl/
1 شیکاری‌یانە، شی‌کردنەوەیی 2 شی‌کەرەوە 3 (زمانەوانی) شیکاری‌یانە، شی‌کردنەوەیی: دادەشکێتەوە بۆ بەکارهێنانی زنجیرەی وشە word order بۆ دەربڕینی پێکهاتەی ڕێزمانی grammatical structure، بەندە بە شی‌کردنەوە تا گەردان(کردن inflection، بڕوانە synthetic) 4 = psychoanalytic ◇ 1 تحلیلی 2 تحلیل‌گر 3 (زبانشناسی) تحلیلی

**analytical chemistry** *noun*
کیمیای شیکاری‌یانە یان شی‌کردنەوەیی ◇ شیمی تجزیه

**analytical geometry** *noun*, also co-ordinate geometry
ئەندازەی شیکاری‌یانە ◇ هندسه‌ی تحلیلی

**analytically** /-kli/ *adverb*
بەشێوەیەکی شی‌کردنەوەیی ◇ به طور تحلیلی

**analytical philosophy** *noun*, also philosophical analysis
فەلسەفەی شیکاری‌یانە یان شی‌کردنەوەیی: بزووتنەوەیێکی فەلسەفی کە بە دوای ڕێگاچارەیێ بۆ دۆز و پرسە فەلسەفی‌یەکان بە شی‌کردنەوەی

دۆزەکاندا دەگەڕێ ◇ فلسفەی تحلیلی

**analytical psychology** *noun*

دەروونناسی شیکارییانە (لە لایەن دەروونناسی سویسییەوە کارل یونگ Carl Jung (1875–1961) ◇ روانشناسی تحلیلی

**analyzable** *adjective*

لەشیکاریهاتوو، لەشیکردنەوەهاتوو، شیدەکرێتەوە ◇ تحلیل‌پذیر

**analyzation** = analysis

**analyzer** *noun*

شیکار، شیکەرەوە، شیتەڵکار ◇ تحلیل‌گر

**anamnesis** /ˌanəmˈniːsɪs/ *noun, pl.* anamneses /-siːz/

1 بیرکەوتنەوە، هاتنەوەبیر، یادکردنەوە (رابردوو)، 2 reminiscence (کڵێسەی کریستانیەت) بەشێ لە the Eucharist کە the Ascension و Resurrection ،Passion مەسیح بیردەخرێتەوە (anamnestic *adj*؛ anamnestically *adv*) ◇ 1 تذکر 2 آنامنسیس

**anamorphosis** /ˌanəˈmɔːfəsɪs/ *noun, pl.* anamorphoses

گۆڕانی بەرەبەرەی شێوەی جۆرێ بۆ جۆرێکی تر بە درێژایی گەشەسەندنی کۆمەڵێ زیندەوەر یان ئۆرگانیزم (anamorphic *adj*) ◇ آنامورفوز

**ananas** = pineapple

**anandrous** *adjective*

(رووەکناسی) بێئەندامی نێرینە، بێنێرک ◇ آناندروس

**Anangu** /ˈɑːnɑːŋuː/ *noun, pl.* same

(ئەوستراڵیا) رەسەن، سەرەتانشین، بنەنشین، ب.ت. کەسێ لە ناوەندی ئەوستراڵیاوە (بنەڕەت: واتای رەسەنەکەی "کەس") ◇ آنانگو

**Ananias** *noun*, Greek, probably from Hebrew *Ḥănanyāh*

1 حەنانیا: پیاوێکی کریستیەنی سەرەتا کە لەبەر درۆ مرد 5:1–5 Acts. 2 درۆزن (بنەڕەت: رەنگە لە *Hānanyāh* عیبرییەوە بێ) ◇ 1 حنانیا 2 دروغ‌گو

**ananthous** *adjective*

(رووەکناسی) بێگوڵ ◇ آنانتوس

**anapaest** /ˈænəpiːst, US -pest/ *noun*, US anapest /ˈænəpest/

ئاناپیست، ئانپیست (= کێشێکی هەڵبەستوانییە، هەڵبەست یان هۆنراوەیێ کە لە دوو بڕگەی کورت و بڕگەیێکی درێژ پێکهاتبێ) ◇ فعلن

**anapaestic** /ˌænəˈpiːstɪk, US -ˈpestɪk/ *adjective, noun*, also anapestic

ئانپیستیک، سەربە یان پێوەندی بە ئاناپیستەوە هەیە (anapaestically *adv*) ◇ وابسته به فَعِلُن

**anaphase** /ˈanəfeɪz/ *noun*

(بۆماوەناسی) ژوورڕوو، ئانافاز، ئانافەیز: سێیەمین قۆناخی دابەشبوونی خانەیی، نێوان metaphase و telophase (anaphasic *adj*: سەربە ئانافاز) ◇ آنافاز

**anaphor** *noun, pl.* anaphors or anaphora

وشە یان دەستەوشەیێ کە ئەرکی ئانافۆریکی هەیە ◇ آنافور

**anaphora** /əˈnæfərə/ *noun*

1 (زمانەوانی یا رێزمان) مەرجەعی پێش‌تر یان پێش‌هاتە (بڕوانە cataphora) 2 (رەوانبێژی) دووبارەبوونەوەی وشە یان دەستەوشەیێکی دوابەدوای‌یەک 3 (کڵێسەی کریستانیەت) بەشێکی (رێوڕەسمی) شێوی خواوەندی کە consecration و anamnesis تیایە (anaphoric /ˌænəˈfɒrɪk, US -ˈfɑːr-/ *adj*؛ -rically *adv*) ◇ 1 مرجع پیشایند 2 و 3 آنافورا

**anaphrodisiac** /əˌnafrəˈdɪzɪak/ *adjective, noun*

(دەرمانی) کەمکەرەوەی ئارەزووی سێکسی، دابەزێنەری ئیشتیای سێکسی ( anaphrodisia *n*) ◇ (داروی) کاهندەی شهوت

**anaphylaxis** /ˌanəfɪˈlaksɪs/ *noun, pl.* -laxes

دیاریزی: زیدە هەستیاری hypersensitivity (وەک سەبارەت بە داودەرمان یا پرۆتینی دەرەکی) لە ئەنجامی لێک‌کەوتنی پێشوویان لەگەڵ ئەواندا؛ کاردانەوەیێکی توندی گیانەوەرێ بە ئانتیژێنێ کە پێش‌تر بەری کەوتووە یان لێک‌کەوتنی contact یان exposure لەگەڵدا بووە (anaphylactic *adj*؛ anaphylacticaly *adv*) ◇ آنافیلاکسیس

**anaplasia** *noun*

گۆڕان یان گەڕانەوەی reversion خانەکان بۆ شێوەیێکی سەرەتایی‌تر primitive (یان لێک‌دانەبڕاو؛ anaplastic *adj*) ◇ آناپلاسیا

**anaptyxis** /ˌanəpˈtɪksɪs/ *noun, pl.* -aptyxes

خستنەسەری بزوێن (نێوان دوو نەبزوێن بۆ یارمەتی گوتنەکەی؛ anaptyctic *adj*: سەربە خستنەسەری بزوێن؛ بنەڕەت: لاتینی نوێ، لە *anaptuxis* یونانی "رەواندنی قەد و لوچی "unfolding) ◇ افزایش واکه

**anarch** *noun*

1 پشێوی‌نەرەوە، ئاژاوەگێڕ 2 حکومەت‌نەویست ◇ 1 آشوب‌گر 2 دولت‌ستیز

**anarchic** /əˈnɑːkɪk, US əˈnɑːrkɪk/ *adjective*, also anarchical /-kl/

1 دژەحکومەت، حکومەت‌نەویست، ئانارشیست، بێ‌قانوون، بێ‌دەولەت، بێ‌حکومەت 2 پشێوی‌خواز، ئاژاوەگێڕ، پاشاگەردانی، ئاخوران‌وباخوران، پشێوی، ئاڵۆزی ◇ 1 دولت‌ستیز 2 هرج‌ومرج‌طلب، آشوب‌گر، هرج‌ومرج

**anarchism** /ˈænəkɪzəm, US ˈænərk-/ *noun*

حکومەت‌نەویستی، ئانارشیزم ( anarchist

*n* :/'ænəkɪst, US 'ænərk-/ *noun, adj*
حکومـەتنەویـستانە، *adj* حکومـەتنەویـستـ
anarchistic /ˌænə'kɪstɪk, US ئانارشیستی؛
(ˌænər'k-/ *adj* ◌ دولەتستیزی

**anarcho-syndicalism** = syndicalism, anarcho-syndicalist = syndicalist

**anarchy** /'ænəki, US 'ænərki/ *noun, pl.* anarchies
1 بێحکومەتی، بێقانوونی 2 ئاڵۆزی، پاشاگەردانی، پشێوی، ناڕێکی، ئاژاوە، گەرەلاوژە 3 حکومەتنەویستی، anarchism
◌ 1 بی‌دولتی، بی‌قانونی 2 بی‌نظمی، آشوب، هرج‌ومرج 3 دولت‌ستیزی

**anasacra** *noun*
ئاوبەندی گشتی لەگەڵ کۆبوونەوەی سیروٚم لە بەستەرەشانەدا (*anasarcous adj*) ◌ آناساکرا

**Anasazi** /ˌanə'sɑːzi/ *noun, pl.* same or -azis
ئاناسازی: دانیشتووانی ڕەسەنی ئەمریکایی پێش‌مێژووی دۆڵ و دەرەکانی ئاریزۆنای باکووری و نیومەکسیکۆ و باشووری ڕۆژاوای کۆلۆرادۆ (دەوروبەری 100 تا 1300 پاش‌زایین؛ بنەڕەت: لە ناڤاهۆیییەوە بە واتای "ڕەچەڵەک و نەژادی دوژمن، کەسێکی کۆن") ◌ آناسازی

**anastigmat** /ə'nastɪgmat/ *noun*
(سیستمی) هاوێنە یان لێنزی ئاناستیگماتیک ◌ لنز آنااستیگمات

**anastigmatic** /ˌanəstɪg'matɪk/ *noun*
ئاناستیگماتیک not astigmatic ◌ آنااستیگمات

**anastomosis** /əˌnastə'məʊsɪs/ *noun, pl.* anastomoses /-siːz/
1 تۆڕ 2 پێک‌گەیشتنەوە، یەک‌گرتنەوە، هاودەمێتی (*anastomotic adj*): 1 تۆڕی 2 سەربە هاودەمێتی یا یەک‌گرتنەوە) ◌ 1 شبکه 2 تلاقی

**anastrophe** /ə'nastrəfi/ *noun*
(ڕەوانبێژی) پەرچەوشە، وشەوەژوو ◌ آناستروف، عکس

**anathema** /ə'naθəmə/ *noun*
1 تەکفیر 2 نەفرەت‌کردن، لەعنەت 3 مایەی بێزاری، شتی بێزەوون 4 کەسێکی مەلعوون، نەفرەت‌کراو ◌ 1 تکفیر 2 لعن 3 امر نفرت‌انگیز 4 شخص ملعون

**Anatolian** *adjective, noun*
*adj* سەربە ئاناتۆلیا *n* 1 خەڵکی ئاناتۆلیا، لە ڕۆژاوای ئاسیای بچووک 2 کۆمەڵە زمانێکی کۆنی تیاچوو کە لقێ لە خێزانی زمانە هیند و ئەورووپایییەکان پێکدێنێ ◌ *adj* وابسته به آناتولی *n* 1 اهل آناتولی 2 گروه زبانی آناتولی

**anatomist** *noun*
1 توێکار، یەکالاکەرەوە 2 شیکەرەوە ◌ 1 کالبدشناس 2 تحلیل‌گر

**anatomy** /ə'nætəmi/ *noun, pl.* anatomies
1 ئاناتۆمی، توێکاری، یەکالاکردنەوە، توێ‌توێ‌کردن: *the department of anatomy* 2 دارەڕا، چوارچێوە، پێکهاتە، داروبار، لەش، جەستە: *and physiology* *the anatomy of the* 3 تاوتوێ‌(کردن)، لێکدانەوە، شیکردنەوە: *human anatomy* ◊ *horse* *an anatomy of the* 4 پێکهاتە یان دارشتەی پێچەڵاوپێچ (*current recession*
anatomical /ˌænə'tɒmɪkl, US -'tɑːm-/ *adj*: ئاناتۆمیکال، یەکالاکردنەوەیی، توێکارییانە: *anatomical diagrams*
anatomically /ˌænə'tɒmɪkli, US -'tɑːm-/ *adv*) ◌ 1 کالبدشناسی، تشریح 2 استخوان‌بندی، بدن 3 بررسی، تجزیه‌وتحلیل 4 ساختار پیچیده

**anatto** = annatto

**-ance, -ence** *suffix*
پاشگر: کار، کردەوە، کردار، بار، دۆخ: *utterance* (بنەڕەت: لە *-ance* فەرەنسی، لە *-antia, -entia* لاتین) ◌ پسوند: عمل، عملیات، طریقه، حالت

**ancestor** /'ænsestə(r)/ *noun*
1 ڕەچەڵەک، پێشینە، کاڵوباب، باووباپیر(ان)، بنەباب، ئەژداد، forebear: ◊ *a reptile that was the common ancestor of lizards and turtles* 2 شێوەی سەرەتایی یان کۆن ◌ 1 جد، نیا 2 شکل ابتدایی

**ancestor worship** *noun*
ڕەچەڵەک‌پەرستی (*ancestor worshiper n*) ◌ نیاپرستی

**ancestral** /æn'sestrəl/ *adjective*
1 باپیرەگەورەیی، باووباپیری، پێشینەیی، ڕەچەڵەکی: *ancestral* ◊ *her ancestral home* 2 سەرەتایی، یەکەمین، دەستپێک *estates* (*ancestrally* /æn'sestrəli/ *adv*) ◌ 1 نیاکانی، ابتدایی 2 نخستین

**ancestress** /'ænsestrəs/ *noun, fem.* ancestor
پێشینە، ڕەچەڵەک (ژن)، دایک‌ودایپر ◌ جده

**ancestry** /'ænsestri/ *noun, pl.* ancestries
ڕەچەڵەک، ڕەگەز، پێشینیان، بەرینان، جسنات، بڕبڕە، ئەژداد، تانوپۆ، lineage: *to have Scottish ancestry* ◌ دودمان، تبار، اسلاف

**Anchises** *noun*, Latin, from Greek *Anchisēs*
ئانکیسێز، ئانکیسیس: باوکی Aeneas کە لە لایەن کورەکەیەوە لە سووتمانی شاری ترۆی Troy رزگار کرا ◌ آنکیسز

**ancho** /'antʃəʊ/ *noun, pl.* anchos
ئانچۆ: جۆری بیبارەسوورەی بۆن‌خۆشی گەورە، هی چێشتی مەکسیکی ◌ آنچو

**anchor** /'æŋkə(r)/ *noun*
1 لەنگەر 2 پشت‌وپەنا، پشتیوان 3 (anchors بریتانیا، نافەرمی) وەستێنەی ماشینی ◌ 1 لنگر 2 تکیه‌گاه، حامی 3 (در جمع) ترمز خودرو

**anchorage** /'æŋkərɪdʒ/ *noun*
1 لەنگەرگا، لەنگەرگە، تابگە 2 لەنگەرانە، (پارەی) لەنگرخستن، لەنگەرگرتن ۞ 1 لنگرگاه 2 آنکوراژ

**anchorite** /'æŋkəraɪt/ *noun*
گۆشەگیر، گۆشەنشین، لاتەریک ( anchoress /'æŋkəres/ *n*: گۆشەگیر، گۆشەنشین، لاتەریک (ژن)؛ anchoritic *adj*) ۞ معتکف، زاهد

**anchorman** /'æŋkəmæn, US -kərm-/ *noun, pl.* anchormen
1 (رادیۆ و تەلەفزیۆن) بەرنامەگێڕ، بەرپرسی پێشکەش‌کردنی بەرنامە و راپۆرت 2 مۆرەی سەرەکی ۞ آنکورمن

**anchorperson** *noun*
(رادیۆ و تەلەفزیۆن) بەرنامەگێڕ، بەرپرسی پێشکەش‌کردنی بەرنامە و راپۆرت ۞ آنکورپرسن

**anchorwoman** /'æŋkəwʊmən, US -kərw-/ *noun, pl.* anchorwomen
(رادیۆ و تەلەفزیۆن) بەرنامەگێڕ، بەرپرسی پێشکەش‌کردنی بەرنامە و راپۆرت (ژن) ۞ آنکوروومن

**anchovy** /'æntʃəvi, US -tʃoʊvi/ *noun, pl.* anchovies
ماسی ئانچۆڤی [توخم *Engraulis*: چەندین جۆرن] ۞ ماهی آنچوی

**anchusa** /əŋ'kju:zə, US an'tʃu:zə/ *noun*
(رووەکناسی) گیایی لە تیرەی borage، بە گوڵی رۆشن زۆرتر شین [توخم *Anchusa*] (بە رێگای لاتین لە *ankhousa* یۆنانی) ۞ آنچوسا

**ancien régime** /ˌɒsɪã reɪ'ʒi:m, French ɑ̃sjɛ̃ ʀeʒim/ *noun*
1 دەزگایێکی رامیاری یان کۆمەڵایەتی کە لە لایەن دەزگایێکی نوێ‌ترەوە لابراوە 2 (بە the A- R) دەزگای رامیاری و کۆمەڵایەتی فەرەنسە، پێش وەرگۆڕانی 1789 ۞ آنسین رژیم

**ancient**[1] /'eɪnʃənt/ *adjective, noun*
*adj* 1 کۆن، کەڤنار، کەون، باستان، مێژینەدار، بەرین، دێرین، زووگین، باستانی، دێرینە، قەدیمی 2 (کۆن و بە شۆخی) پیر، کۆن، دێرساڵ، بەسەلاچوو (the ancient) *n* خەڵکی کەونار، زووژیاوان (ب.ت. میسر، یۆنان و رۆمی‌یەکان؛ anciently /'eɪnʃəntli/ *adv*: لە کۆنەوە، لە زووەوە؛ ancientness *n*: کۆنی، مێژینەداری، کەوناری، دێرینێتی) ۞ *adj* 1 باستان، باستانی، قدیمی 2 سالخورده *n* مردم باستان

**ancient**[2] /'eɪnʃənt/ *noun*
(کۆن) ئاڵا، بەیداخ یان ئاڵای کەشتی ۞ پرچم

**ancient history** *noun*
1 مێژووی کۆن یا باستان (لە سەرەتای مێژووەوە تا رووخانی ئیمپراتۆری رۆمی رۆژاوا لە ساڵی 476ی زایینیدا) 2 مێژووی شارستانیەتەکانی یۆنان و رۆما ۞ 1 تاریخ باستان 2 تاریخ تمدن‌های یونان و روم

**ancient monument** *noun*
کەلەپووری کولتووری، شوێنەواری مێژوویی ۞ بنای تاریخی

**ancientry** /'eɪnʃəntri/ *noun*
1 کۆنی، دێرینێتی، antiquity، ancientness 2 شتی کۆن ۞ 1 کهنگی 2 چیز قدیمی

**ancilla** *noun*
یاریدەدەر، یارمەتیدەر، ئالیکار، ئاریکار ۞ دستیار

**ancillary** /æn'sɪləri, US 'ænsəleri/ *adjective, noun* (*pl.* ancillaries)
1 یاریدەدەر، ئاریکار، ژێردەست، لاوەکی، لابەلایی، پاشکۆ، سەرخستە 2 لادەستە، خانوویەرەی لاوەکی، دەستەی لاوەکی (لە کۆمەڵە خانوویی؛ بنەڕەت: لە *ancillaries* لاتین، لە *ancilla* "maidservant") ۞ 1 معین، کمکی، فرعی، تابع 2 ساختمان فرعی

**ancon** /'aŋkɒn, US -k(ə)n/ *noun, pl.* ancones /aŋ'kəʊni:z/
(بیناسازی) ئانیشکە: دەرپەڕیوی‌یێ کە cornice ی لەسەرە (بنەڕەت: بە رێگای لاتین لە *ankōn* یۆنانی "elbow، bend") ۞ سگدست طوماری

**-ancy, -ency** *suffix*
پاشگر: دۆخ، بار، چۆنیەتی (بنەڕەت: لە *-antia* لاتینەوە) ۞ پسوند: حالت، کیفیت

**ancylostomiasis** /ˌaŋkɪlə(ʊ)stə(ʊ)'mʌɪəsɪs, US ˌansɪ-/ *noun*, also ankylostomiasis
ئەنسیلۆستۆمیاسیس (= کەم‌خوێنی توند لە ئەنجامی مژینی هێندێ کرمی مشەخۆری خوێ لە ریخۆڵە باریکەدا؛ بنەڕەت: لە *Ancylostoma* لاتینی نوێ، توخمێکی hookworm ـەکان + -iasis) ۞ آنسیلوستومیاسیس

**and** /ənd, US ən, US n, US ænd/ *conjunction*
و، وە، لەگەڵ، تا، هەتا، کە، هەروەها: *bread and butter* ۞ و، با، تا، که، هم‌چنین

**-and** *suffix*
پاشگر: (ناو سازدەکا) ئاماژە بە کەسێ یان شتێ کە بە شێوەیێکی تایبەتی باس بکرێ: *analysand* ۞ پسوند: اسم‌ساز

**Andalusian** /ˌandə'lu:zɪən, -sɪən/ *noun, adjective*
*n* 1 خەڵکی ئاندێلوس 2 جۆرێ نژادی ئەسپ *adj* سەربە ئاندێلوس ۞ آندلوسی

**andalusite** /ˌandə'lu:sʌɪt/ *noun*
کانێکی ئالومینۆسیلیکاتی بۆر، سەوز، قاوەیی یان پەمەیی $Al_2SiO_5$، لە کەڤرە schistose ـەکاندا دۆزراوەتەوە؛ بنەڕەت: لە ناوی

Andalusia (ناوچەیێکی سپانیا) ۞ آندالوسیت

**Andamanese** *noun (pl. -ese), adjective*
*n* 1 ئەندامی گەلێکی بە جەستە جیاواز کە دانیشتووانی ڕەسەنی دوورگەکانی ئەندامان Andaman دەگرێتەوە 2 زمانە ئەندامانییەکان، گریدایی ئەوتۆی بە زمانەکانی تری جیهانەوە نییە *adj* سەربە دوورگەکانی ئەندامان (هی هیند)، خەڵکەکەی یان زمانەکانیان ۞ آندامانی

**andante** /æn'dænteɪ/ *adjective, adverb, noun* (*pl.* andantes)
(موسیقا) *adj, adv* بە شێنەیی *n* پارچە یان جوولەیێکی ئاندانتە ۞ آندانته

**andantino** /ˌandan'tiːnəʊ/ *adverb, adjective, noun, pl.* andantinos or -dantini
(موسیقا) *adv, adj* کەمێ توندتر لە ئاندانت *n* پارچە یان جوولەیێکی ئاندانتینۆ ۞ آندانته

**Andean** /an'diːən, 'andɪən/ *adjective, noun*
*adj* 1 ئاندی، سەربە ئاند یان ئاندیز Andez (زنجیرەچیایێکی باشووری ڕۆژاوای ئەمریکا، بەرزترینی Aconcagua (6960 میتر، 22,834 پێ) هەیە 2 بەرز، بڵیند *n* خەڵکی ئاندیز، ئاندیزی ۞ *adj* 1 آندی 2 کرتفع *n* اهل آندیز

**Anderson shelter** *noun*
جۆرێ پەناگەی هێرشی ئاسمانی، بە درێژایی شەڕی جیهانی دووهەمدا لە بریتانیا سازکرا (بنەڕەت: لە ناوی سێر John *Anderson* وەزیری نێوخۆی بریتانیا 1939–40) ۞ آندرسون شلتر

**andesite** /'andɪzʌɪt, US -saɪt/ *noun*
(زەویناسی) جۆرێ بەردێکی گرکانی ڕەش کە لە بنەڕەتا لە فیلدسپاری plagioclase و یەک یان چەند کانی مافیک mafic پێکهاتووە، وەک hornblende و biotite (andesitic: *adj* سەربە یان پێوەندی بە ئاندیزایتەوە هەیە ؛ لە ناوی چیاکانی *Andes*) ۞ آندسیت

**andiron** /'andʌɪən/ *noun*, also firedog
سێ پایە یا سێ پاچکەی بەر ئاگردان یا کوورە، سێ پایەی کوورە ۞ آندریون

**Andorran** /an'dɔːrən/ *adjective, noun*
*adj* سەربە ئاندۆرا، ئاندۆرایی *n* خەڵکی میرنشینی بچووکی خۆبەڕێوەبەری ئاندۆرا ۞ *adj* وابسته به آندورا *n* اهل آندورا

**andradite** /'andrədʌɪt/ *noun*
جۆرێ کان لە کۆمەڵی garnet، کە کالسیۆم و ئاسنی تیایە (بنەڕەت: لە ناوی زەویناسی برێزیلی J. B. de *Andrada* e Silva) ۞ آندرادیت

**andr(o)-** *prefix*
پێشگر: مرۆ، مروڤ: سەربە پیاوان؛ نێر، ئەندام یان بەشێکی نێر: *androcentric*، *androecium* (بنەڕەت: لە *anēr, andr-* یۆنانی "پیاو") ۞ پیشوند: انسان؛ وابسته به مردان؛ نر

**androcentric** /ˌandrə(ʊ)'sɛntrɪk/ *adjective*
مرۆڤ‌تەوەر، مرۆڤ‌ناوەند (androcentrism *n*: مرۆڤ‌تەوەری، مرۆڤ‌ناوەندی) ۞ انسان‌محور

**Androcles** *noun*, Latin, from Greek *Androklēs*
ئاندرۆکلیس: کۆیلەیێکی ڕۆمی سەدەکانی یەکەم و دووهەمی پاش زایین کە لە arena دا بە دەستی شێرێ کوژرا ۞ آندروکلس

**androcracy** /an'drɒkrəsi/ *noun, pl.* -racies
پیاوسالاری، پیاوفەرمانداری، پیاومیری ۞ مردسالاری

**androecium** /an'driːsɪəm/ *noun, pl.* androecia /-sɪə/
نێرخانە، سەرجەم نێرەک یان پۆرگەکانی گوڵ، کۆمەڵەی نێرەک (androecial *adj*: سەربە androecium) ۞ مجموعه‌ی پرچم گل

**androgen** /'ændrədʒən/ *noun*
ئەندرۆژین، مێرژین (بنەڕەت: لە *anēr, andr-* یۆنانی "مێر، پیاو" + -gen) هۆرمۆنی پیاوەتی (androgenic *adj*: ئەندرۆژینی) ۞ آندروژن

**androgyne** /'andrədʒʌɪn/ *noun*
1 کەسێکی نێرەمووک androgynous 2 نێرەمووک، نەنێرنەمێ، دووەگەزی، نێرمایی ۞ 1 فرد دوجنسیتی 2 دوجنسیتی

**androgynous** /æn'drɒdʒənəs, US -'drɑːdʒ-/ *adjective*
دووڕەگەزە، نەنێرنەمێو، نێرما، نێرەمووک (androgyny *n*: نێرەمووکی، نەنێرنەمێوی، نێرمایی، دووڕەگەزی) ۞ دوجنسیتی، خنثی

**android** /'ændrɔɪd/ *adjective*
مرۆڤی خۆکار یان ئۆتۆماتیک، شێوەمرۆ، مرۆ(ئا)سا ۞ انسان‌واره

**Andromache** *noun*, Latin, from Greek *Andromachē*
ئاندرۆمەیک، ئاندرۆماک: ژنی هێکتۆر پاڵەوانی ترۆی Hector ۞ آندروماک

**Andromeda** *noun*, Latin, from Greek *Andromedē*
1 ئاندرۆمیدا: شازادەی ئەتیۆپیایی میتۆلۆژی یۆنانی کە لە لایەن مێردی داهاتوویەوە Perseus لە دەس دیوێ ڕزگار کرا 2 ژنی بەزنجیر یان زنجیردار: باکووریترین onstellation، ڕاست لە باشووری Cassiopeia، نێوان Pegasus و Perseus ۞ 1 آندرومدا 2 مرأةالمسلسله

**andromeda** /an'drɒmɪdə/ = bog rosemary

**androstenedione** /ˌandrɒstiːn'daɪəʊn/ *noun*
(زیندەکیمیا) ئاندرۆستیندایۆن، ئاندرۆستیندیۆن: ناوێتەیێ کە لەودا تێستۆستیرۆن و هێندێ ئۆستروژێن لە مرۆڤدا لە لایەن باتووەکان و هێلکەدان و هتد بەرهەم دێنرێ [$C_{19}H_{26}O_2$] ۞ آندرواستندیون

**androsterone** /ˌandrə(ʊ)ˈstɪərəʊn, US anˈdrɒstərəʊn/ *noun*
(زینده‌کیمیا) هۆرمۆنێکی ڕەگەزی تا ڕادەیێ چالاکی پیاوان، کە لە لایەن میتابۆلیزمی تیستۆستیرۆنەوە دیتەبەرهەم ۞ آندرواسترون

**-androus** *suffix*
پاشگر: (ڕووەک‌ناسی) خاوەنی ئەندامە نێرەکی یان پۆرگی‌یەکانی جۆرێکی تایبەتی: *polyandrous* (بنەڕەت: لە *-andrus* لاتین، لە *-andros* یۆنانی "male" + -ous) ۞ پسوند: دارای اعضای پرچمی از نوع خاص

**-ane**[1] *suffix* variant spelling of -an, often with a distinction of sense (such as *humane* compared with *human*)
پاشگر: (کیمیا) ناوی هایدرۆکاربۆنە پاراو یان تێرەکان ساز دەکا: *propane* ۞ پسوند: اسم‌ساز

**-ane**[2] *suffix*
پاشگر: (کیمیا) ناوی هایدرۆکاربۆنە پاراو یان تێرەکان ساز دەکا: *propane* ۞ پسوند: اسم‌ساز

**anear** = near

**anecdotage** /ˈanɪkdəʊtɪdʒ/ *noun*
1 حیکایەت، داستان، لاچیرۆک 2 پیری ۞ 1 حکایت 2 پیری

**anecdote** /ˈænɪkdəʊt, US -doʊt/ *noun*
لاچیرۆک، حەقایەت، چیرۆک، داستان (خۆش و پێکەنینی بێ: anecdotal /ˌænɪkˈdəʊtl, US -ˈdoʊtl/ *adj*: شێوەچیرۆک، لەداستان‌چوو، داستانی، چیرۆکی، چیرۆک‌ئاسا؛ anecdotalist *n*؛ -tally *adv*) ۞ حکایت، داستان همراه با خنده

**anechoic** /ˌanɪˈkəʊɪk/ *adjective*
بێ‌دەنگ‌دانەوە، دەنگ‌گر، دەنگ‌بەند، دەنگ‌مرێن ۞ بدون پژواک

**anelectric** *adjective*
ناکارەبایی، نائێلیکتریکی، نابرقی ۞ غیربرقی

**anem(o)-** *prefix*
پێشگر: با (بنەڕەت: لە *anemos* یۆنانی‌یەوە "wind") ۞ پیشوند: باد

**anemia; anemic** = anaemia; anaemic

**anemograph** /əˈnɛməgrɑːf/ *noun*
بانووس، باگراف (anemography *n*: بانووسی، باگرافی) ۞ بادنگار

**anemology** /ˌænɪˈmɒlədʒɪ/ *noun*
باناسی، بالۆژی ۞ بادشناسی

**anemometer** /ˌænɪˈmɒmɪtə(r), US -ˈmɑːm-/ *noun*
باپێو: ئامێرێ بۆ پێوان و دەرخستنی هێز و خێرایی با (anemometric *adj*: سەربە باپێوی، باپێوی‌یانە؛ anemometry *n*: باپێوی) ۞ بادسنج

**anemone** /əˈnemənɪ/ *noun*
1 گوڵەنیسان، گوڵاڵە، باتینۆک، گاگرۆ، گوڵ‌بەهار [توخم *Anemone*: گەڵی جۆرن] 2 کورتەی sea anemone ۞ شقایق نعمانی

**anemone fish** = clownfish

**anemophilous** /ˌanɪˈmɒfɪləs/ *adjective*
بەباچاکراو، چاک‌کراو بە با (anemophily *n*) ۞ لقاح‌شونده توسط باد

**anemoscope** *noun*
باپین، بادوز ۞ بادنما

**anencephalic** /ˌanɛnsɪˈfalɪk, -kɛˈfalɪk/ *adjective*
(پزشکی) بێ‌مێشک (= نەبوونی زگماکی congenital absence هەموو یا بەشێکی گەورە لە مێشک، *n* -ephaly: بێ‌مێشکی) ۞ بی‌مغزی

**anent** /əˈnɛnt/ *preposition*
1 دەربارەی، لەبارەی، لەمەڕ، لە بابەت 2 لە دەوروبەری ۞ 1 راجع به 2 در اطراف

**anergia** /aˈnəːdʒɪə/*adjective*
نەبوونی ناسایی وزە، بێ‌وزەیی ۞ انرژیا

**aneroid** /ˈænərɔɪd/ *adjective*
وشک، برینگ، بێ‌ئاو (بنەڕەت: لە *-a* "نا" + *nēros* "ئاو") ۞ خشک

**aneroid barometer** *noun*
پەستان‌پێوی کانزایی ۞ فشارسنج فلزی

**anesthesia** = anaesthesia

**anesthesiologist** = anaesthesiologist

**anesthetic** = anaesthetic

**anesthetist** = anaesthetist

**anesthetization** = anaesthetization

**aneurysm** /ˈænjərɪzəm/ *noun*, also aneurism
کشانی بۆری‌یەکانی خوێنی، ڕەگ‌کشان، ڕەگەکشێ ۞ آنوریسم

**aneurysmal** *adjective*
سەربە aneurysm ۞ وابسته به آنوریسم

**anew** /əˈnjuː, US əˈnuː/ *adverb*
دیسان، هەمیسان، جارێکی تر، لە سەڵا(وە)، سەرلەنوێ، لە نووکەوە، ژنووقە، دووبارە: *They started life -ew in Canada* ۞ مجدداً، دوباره

**anfractuosity** /ənˌfraktʃuːˈɑsetɪ/ *noun, pl.* anfractuosities
پێچ‌وپەنایی، پێچەڵاوپێچی، ناڕاستەوخۆیی، خواروخێچی ۞ پیچ و خم

**anfractuous** /ənˈfraktjʊəs/ *adjective*
پێچ‌وپەنا، پێچاوپێچ، پێچەڵاوپێچ، خواروخێچ، tortuous ۞ پیچ و خم‌دار

**angel** /ˈeɪndʒl/ *noun*
1 فریشتە، مەلایکەت 2 کوێنی پەرینی ئینگلتەرە 3 (نافەرمی) پەیام یان سیگناڵێکی ڕوونەوەنەبووی ڕاداری 4 کەسێکی یەکجار جوان یان باش، ڕوویەری، فریشتە ۞ 1 فرشته، مَلَک 2 و 3 انجل 4 آدم زیبا یا پری‌رخ

**angel cake** *noun*
کەیکی فریشتەیی، ناردەپێچ؟ ۞ کیک فرشته‌ای

**angel dust** *noun*
(تافـەرمـی) تـۆزی فریـشتە: 1 دەرمـانی hallucinogenic (phencyclidine hydrochloride) 2 – وشـەیێکـی تـر بـۆ clenbuterol ۞ آنجل داست

**Angeleno** /ˌandʒəˈliːnəʊ/ *noun,* also Los Angeleno, Angelino, *pl.* Angelenos
رەسەن یان دانیشتووی لۆس‌ئانجلێس ۞ اهل لوس‌آنجلیس

**angel-fish** /ˈeɪndʒlfɪʃ/ *noun, pl.* same or angel-fishes
فریـشتەماسی [*Pterophyllum scalare* و جۆرەکانی تر] ۞ فرشته‌ماهی

**angelic** /ænˈdʒelɪk/ *adjective,* also angelical
فریشتەئاسا، فریشتەیی، ئاسمانی (angelically /-kli/ *adv*: فریشتەئاسا، مەلایەکەت‌ئاسا) ۞ فرشته‌مانند، ملکوتی

**angelica** /ænˈdʒelɪkə/ *noun*
گیافریـشتانە؟، دەرمانـەگمێز؟: رووەکێکـی بۆن‌خۆشـی دریـژی خێـزانی parsley [تـوخم *Angelica*: زۆر جۆرن] (لە *(herba) angelica* لاتینی نوێ "angelic (herb)"، لەبەر ئەوە ناو نـراوە کـە بـاوەڕ وایـە (کاریگـەری‌یێکـی) یەکاویەکی efficacious بێ بەدژی نەخۆشی یان ژاراوی‌بوون poisoning) ۞ سنبل ختایی

**angelica tree** *noun,* also hercules'-club 2
داری لە تیرەی ginseng، بە گەڵای گەورەوە و بـەرێکـی رەشـەوە [تـوخم *Aralia*: چـەنـدین جۆرن] ۞ نوعی درخت

**angelocracy** *noun*
فریـشتەسالاری، فریـشتەمـیری، حکومـەتی فریشتەکان ۞ حکومت فرشتگان

**angel's trumpet** *noun*
دەوەنێکـی ئـەمریکای باشـووری بـە گوڵـی گـەورەی کەرەناناسـای شـۆڕەوەبوو [تـوخم *Brugmansia*] ۞ نوعی درخت‌چه

**angelus** /ˈændʒələs/ *noun,* also the Angelus
ئانجی‌لێس، ئانجیلۆس (کلێسەی کاتۆلیکی رۆم) پاڕانـەوە یـان نـوێژی مریـەم، زەنگـی نـوێژ یـان پاڕانەوە ۞ آنجلس

**angel wings** *noun, pl.*
جـۆری piddockی خـۆراکی زلـەی سپی، هـی کارائیـب و کـەناری رۆژهـەڵاتی ئـەمریکای باکووری [*Barnea costata*] ۞ نوعی نرم‌تن

**anger** /ˈæŋɡə(r)/ *noun*
قەڵـسی، تووڕەیی، رک، رق، قین، ئاژر، شیێور ۞ غضب، خشم، عصبانیت

**Angevian** /ˈandʒəvɪn/ *noun*
1 خەڵک یان رەسەنی یان دەسەڵات‌داری ئانجو Anjou، لە رۆژاوای فەرەنسە 2 هەریەک لە پادشایانی پلانتاژێنت Plantagenetی ئینگلتەرە، ب.ت. کوتتەکانی ئانجو (Henry II، Richard I و John) ۞ آنجویی

**angina** /ænˈdʒaɪnə/ *noun, also* angina pectoris /ænˌdʒaɪnə ˈpektərɪs/
1 سنگ‌ئێشە، ژانەسنگ، گەروو ئێشە، دووشاخە، ماسینی گەروو، وەناق، ئەنژین 2 بۆ ناوی ئەو ناڕەحەتی و ناسازی‌یانە بەکاردێتری کە ژانی گـەروو دەگرێتـەوە: *Ludwig's angina* (بنـەڕەت: لـە لاتـین "quinsy"، لـە *ankhonē* "strangling"؛ *pectoris* "سـەربـە سـنگ") ۞ 1 آنژین صدری، خناق 2 آنژین

**anginal** *adjective*
سـەربە یـان پێـوەنـدی بـەanginaوە هـەیـە ۞ وابسته به آنژین صدری یا خناق

**angio- (or angi)** *prefix*
پێشگر: 1 بۆری، لوولە، رەگ، سەربە رەگەکانی خـوێن یـان لـەشـاو (لیمـف) *angiography* 2 (سـەربـە) بـەرگ، تـوێکڵ، کـەلوو، جێگـا، دەفر، تـووردان، دەورەبـەر pericarp: *angiosperm* (بنەڕەت: لە *angeion* یۆنانی‌یەوە "vessel") ۞ پیـوند: 1 وابسته به رگ‌های خونی 2 (وابسته به) غلاف (بذر)، ظرف

**angiocardiography** *noun, pl.* -diographies
تاقی‌کردنەوەی دڵ و رەگـەکـانی خـوێنی (دڵ) دوای لێـدانی شـلە یـان مـاکێکی تیـشکـبەنـد radiopaque (angiocardiographic *adj*: سـەربە ئانژیۆکاردیۆگرافی) ۞ انژیوکاردیوگرافی

**angiocarpous** *adjective*
خاوەنی بەر یان میوەیێ کە لەنێو بـەرگێک دایە ۞ انژیوکارپوس

**angiogenesis** *noun*
(کارئەندام‌ناسی، پەرەسەندن یان) پێکهاتنی رەگە تازەکانی خوێن، رەگـازۆ(کردن؛ angiogenic *adj*) ۞ رگ‌زایی

**angiogram** /ˈandʒɪə(ʊ)ɡram/ *noun*
وێنـەی تیـشکی ئـێکس لـە رەگـەکانی لەشـاو lymph یان خـوێن، بە angiography دەگیرێ ۞ انجیوگرام

**angiography** /ˌandʒɪˈɒɡrəfi/ *noun, pl.* -ies
رەگـۆگرافی، ئـانژیۆگرافی: رادیـۆگرافی رەگـە خوێنی یان لەشاوی‌یەکان پاش لێدانی مـاکێکی تیشک‌بەند radiopaque (angiographic *adj*: سـەربە رەگۆگرافی یا ئانژیۆگرافی) ۞ انجیوگرافی

**angiology** *noun*
رەگ‌ناسی، بـۆری‌ناسی، زانـستی بـۆری‌یـەکانی خـوێنی و لیمفـاوی (یـان رەگـە خـوێنی و لەشاوی‌یەکان) ۞ مبحث اوعیه

**angioma** /ˌandʒɪˈəʊmə/ *noun, pl.* angiomas or angiomata /-mətə/
تومۆرێکی (نائاسایی) کە لە رەگـە خوێنی‌یـەکان

(haemangioma) یان ڕەگە لەشاوییەکان (lymphangioma) lymph vessels پێکهاتووە (angiomatous *adj*) ◌ انژیوما

**angioneurotic** *adjective*

(پزشکی، لەبارەی ئاوبەندەوە) oedema چەند بەشێ لە پێست دەماسێ یان دەخورێ (دەکەوێتە خارشت) ◌ انژیونروتیک

**angioplasty** /ˈandʒɪə(ʊ)ˌplasti/ *noun, pl.* angioplasties

(پزشکی) چاکردنەوە یان سازکردنەوەی نەشتەرگەرییانەی ڕەگەکانی خوێن، ب.ت. هی coronary artery ◌ انژیوپلاستی

**angiosperm** *noun,* also flowering plant

(ڕووەکناسی) نەهێنتوو، نهێنتوو، ڕووەکی گوڵدار: ڕووەکی کۆمەڵێکی بەربڵاو (پۆل Angiospermae یان پار و دیڤیژنی Magnoliophyta) کە هەموو ڕووەکە گوڵدارەکان دەگرێتەوە (وەک magnolia کان، زۆربەی دار و دەوەنەکان، گیاکان، بەڕووەکان، گوڵەباخەکان rose و گوڵە میناکان daisy، پروانه (gymnosperm ◌ گیاه نهاندانه، انژیواسپرم

**angiospermous** /-ˈspəːməs/ *adjective*

نەهێنتوو، نهێنتوو، (ڕووەکی) گوڵدار ◌ نهاندانه

**angiotensin** /ˌandʒɪə(ʊ)ˈtɛnsɪn/ *noun*

(زیندەکیمیا) ئانژیۆتێنسین، ئانژیۆتێنزین: پرۆتینێکی پلازمایی کە پاڵەپەستۆ یان گوشاری خوێن دەباتە سەرەوە و هانی adrenal cortex دەدا بۆ بەرهەم هێنانی دەردانی aldosterone ◌ آنژیوتنزین

**angitis** *noun*

ڕەگئاوسان، ڕەگەئاوسێن، هەوکردنی ڕەگ ◌ ورم رگ

**angle**[1] /ˈæŋgl/ *noun*

1 گۆشە، سووچ، کونجێک، موور، قولینچک، گوونیا (گۆشەی پڕ right angle) 2 بۆچوون، ڕوانگە، دید و بۆچوون، تێرین، دیتن: *We need a new angle for our next advertising campaign* ◌ 1 زاویه، گوشه 2 نقطهنظر، دید

**angle**[2] /ˈæŋgl/ *noun*

(کۆن) قولاپی ڕاوەماسی ◌ قلاب ماهیگیری

**Angle** *noun*

ئەندامی گەلێکی کۆنی ئەڵمانیایی کە لەگەڵ Saxon و Jute ەکان لە سەدەی پێنجەمی پاشزایین بەلاماری بریتانیایان دا و لەوێ سەقامگیربوون، ناوی ئینگلتەرە لەوانەوە داکەوتووە ◌ آنگل

**angle bracket** *noun*

کەوانەی گۆشەیی یان گۆشەدار (<>) ◌ نوعی نشانه

**angled** *adjective*

گۆشاوی، سووچن، گۆشەدار، گۆشەگۆشە ◌ مزوی

**angle iron** *noun*

ئاسنی گۆشەدار، ئاسنی گۆشاوی یان گۆشە ◌ آهن نبشی

**angle of contact** *noun*

گۆشەی لێکەوت(ن) ◌ زاویەی تماس

**angle of depression** *noun*

گۆشەی نزمبوونەوە یان نەویبوون ◌ زاویەی انخفاض

**angle of elevation** *noun*

گۆشەی بەرزبوونەوە (بەرزایی) ◌ زاویەی ارتفاع

**angle of friction** *noun*

گۆشەی لێکخشان ◌ زاویەی اصطکاک

**angle of incidence** *noun*

(فیزیک) گۆشەی کەوتن ◌ زاویەی تابش

**angle of reflection** *noun*

گۆشەی دانەوە یان پەرچانەوە ◌ زاویەی بازتاب

**angle of refraction** *noun*

(ڕووناکیناسی) گۆشەی شکانەوە ◌ زاویەی انکسار

**angler** /ˈæŋglə(r)/ *noun*

ماسیگر، ڕاوچی (ماسی) ◌ ماهیگیر

**anglerfish** *noun, pl.* same or anglerfishes

جۆرێ ماسی کۆسە [*Lophius piscatorius* و زۆر جۆری تر] ◌ انجلرفیش

**angle shades** *noun, pl.*

جۆرێ پەپوولەی شەوگەڕ [*Phlogophora meticulosa*] ◌ نوعی پروانه

**angle wings** *noun, pl.*

پەپوولەیێکی ئەمریکای باکووری کە پێوەندی هەیە یان شێوەی comma دەدا [تۆخم *Polygonia*: چەندین جۆرن] ◌ نوعی پروانه

**angleworm** = earthworm

**Anglian** /ˈaŋglɪən/ *adjective, noun*

Angle سەربە Angles کۆن *adj* 1 ئەندامی *n* ەکان 2 زاراوە کۆنەکانی ئینگلیسی Mercia و Northumbria ◌ *adj* وابسته به انگلیس باستانی *n* 1 عضو آنگلها 2 لهجههای باستانی انگلیسی

**Anglican** /ˈæŋglɪkən/ *adjective, noun*

*adj* ئەنگلیکان، سەربە کلیسەی ئینگلتەرە *n* ئەندامی کلیسەی ئینگلتەرە ◌ *adj* آنگلیکان *n* عضو کلیسای آنگلیکان

**Anglicism** /ˈæŋglɪsɪzəm/ *noun*

زاراوە، وشە یان دەستەوشەی ئینگلیسی، ئینگلیسیگەری ◌ آنگلیسیسم

**angling** /ˈæŋglɪŋ/ *noun*

ماسیگری، ڕاوەماسی ◌ ماهیگیری

**Anglo** /ˈæŋgləʊ, US ˈæŋgloʊ/ *noun, pl.* Anglos

1 Anglo-American = 2 دانیشتووێکی سپیپێستی ئەمریکا نە لە ڕەگەزی ناهیسپانیک

non-Hispanic ○ آنگلو

**Anglo-** /'æŋgləʊ, US 'æŋgloʊ/ *prefix*
پێشگر: ئینگلیسی، ئینگلیسی و: *anglophone* (بنەڕەت: لە *Anglo-Latin* لاتین *Anglus*
"English") ○ پیشوند: انگلیسی، انگلیسی و

**Anglo-American** *noun, adjective*
ئەمریکایی بەڕەچەڵەک ئینگلیسی، ئینگلیسی‌ـئەمریکایی، دانیشتووی ئەمریکا بەڵام لە ڕەگەزی ئینگلیسی ○ امریکایی انگلیسی‌تبار

**Anglo-Catholic** *noun, adjective*
ئەندامی کلێسەی ئینگلتەرە کە لەباری باوەڕ و بنچینەکانەوە یەکجار لە کلێسەی کاتۆلیکی ڕۆم دەچێ (Anglo-Catholicism *n*) ○ آنگلوکاتولیک

**Anglo-Celt** *noun*
کەسێ لە ڕەگەزی ئینگلیسی‌ـئیرلەندی ○ فردی از نژاد انگلیسی‌ـایرلندی

**Anglocentric** *adjective*
ئینگلتەرەتەوەر، ئینگلتەرەناوەند ○ انگلیس‌محور

**Anglo-French** *adjective*
ئینگلیسی‌ـفەرەنسی، نێوان ئینگلتەرە و فەڕەنسە ○ انگلیسی‌ـفرانسوی

**Anglo-Indian** *noun, adjective*
دوورەگەی ئینگلیسی‌ـهیندی، (کەس) لە ئینگلتەرە لەدایکبوو لە هیندژیاو ○ دورگەی انگلیسی‌ـهندی

**Anglo-Irish** *adjective*
1 سەربە بریتانیا و ئیرلەند (یان کۆماری ئیرلەند) 2 دانیشتووی بە ڕەچەڵەک ئینگلیسی 3 لە باوانی ئینگلیسی یا ئیرلەندی ○ انگلیسی‌ـایرلندی

**Anglo-Latin** *noun*
زمانی لاتین کە لە سەدەکانی نێوەڕاست لە ئینگلتەرە بەکاردێرا ○ انگلو‌ـلاتین

**Anglomania** /ˌæŋgləʊ'meɪnɪə, US ˌæŋgloʊ-/ *noun*
شێت یا لایەنگری ئینگلتەرە، ئینگلتەرەپەرستی (Anglomaniac *n*) ○ انگلیس‌زدگی

**Anglophile** /'æŋgləʊfaɪl, US 'æŋgloʊ-/ *adjective, noun*
ئینگلتەرەدۆست، ئینگلتەرخۆشەویست ○ دوستدار انگلستان

**Anglophobe** /'æŋgləʊfəʊb, US 'æŋgloʊfoʊb/ *adjective, noun*
دژەئینگلیزی، (لە) ئینگلیسی‌بێزار، (لە) ئینگلیسی‌ترس ○ انگلستان‌ستیز

**Anglophobia** /ˌæŋgləʊ'fəʊbɪə, US ˌæŋgloʊ'foʊbɪə/ *noun*
دژەئینگلیزیتی، (لە) ئینگلیسی‌بێزاری، (لە) ئینگلیسی‌ترسی، ڕق یان ترس لە ئینگلیسی یان بریتانیایی ○ انگلستان‌ستیزی

**Anglophone** /'æŋgləʊfəʊn, US -oʊfoʊn/ *adjective, noun*
ئینگلیسی‌زمان ○ انگلیسی‌زبان

**Anglo-Saxon** *noun, adjective*
ئینگلیسی کۆن، کەسێ لە ڕەچەڵەکی ئینگلیسی، کەسێکی ئینگلیسی پێش قۆناخی داگیرکردنی (Norman) لە ساڵی 1066دا ○ آنگلوساکسون

**Angolan** /æŋ'gəʊlən/ *adjective, noun*
*adj* سەربە ئانگۆلا *n* خەڵکی ئەنگۆلا، وڵاتێ لە باشووری ڕۆژاوای ئەفریکا ○ *adj* وابسته به آنگولا *n* اهل آنگولا

**angora** /æŋ'gɔːrə/ *noun, adjective*
*n* ئەنگۆرا (پشیلە، بزن یان کەروێشک)، مەرەز، خوری ئەنگۆرا *adj* ئەنگۆرا ○ *n* آنقره *adj* آنقره

**angora wool** *noun, adjective*
خوری ئەنگۆرا، مەرەز ○ پشم آنقره

**angostura** /ˌæŋgə'stjʊərə, US -'stʊrə/ *noun*
(هەروەها angostura bark) 1 تویکڵی تاڵ و بۆنخۆشی دوو جۆر داری ئەمریکای باشووری 2 [*G. cusparia* یان *Galipea officinalis*] (هەروەها trademark Angostura bitters) جۆرێ tonic ○ انگوستورا

**angrily** /-əli/ *adverb*
توند، بە توندی، بە تووڕەیی‌یەوە ○ با عصبانیت

**angriness** /'æŋgrinəs/ *noun*
ڕق‌هەستاوی، تووڕەیی، توندی ○ عصبانیت

**angry** /'æŋgri/ *adjective* (angrier, angriest)
1 تووڕە، قەڵس، توند، بەڕق، ڕق‌هەستاو، نگری 2 پڕبا، ئاڵۆز، شەپۆلاوی (دەریا) 3 گڕگرتوو، سوورەوەبوو، بەژان، بەسوێ (برین) ○ 1 خشمگین، غضبناک، عصبانی 2 توفانی 3 ملتهب

**angst** /æŋst/ *noun*
(لە ئاڵمانی‌یەوە بە واتای "ترس") نگەرانی، ترس، دەروونتەنگی، ئارام‌لێ‌هەڵگیراوی، دڵەڕاوکێ، نارەحەتی (ب.ت. لە ڕەوش و بارودۆخی جیهاندا) ○ اضطراب، نگرانی

**angsty** *adjective*
نگەران، ترس‌دار، دەروون‌تەنگ، ئارام‌لێ‌هەڵگیراو، ناارام، نارەحەت ○ مضطرب، نگران

**angstrom** /'æŋstrəm/ *noun*, also ångström /'ɒŋstrɔːm/
(کیمیا) ئەنگستریم، ئەنگستروم: یەکەی درێژایی بەرامبەر بە سەدملیۆن‌یەکی سانتی‌میترێ، $10^{-10}$ میترێ (یان دەبیلیۆن‌یەکی میترێ؛ بنەڕەت: لە ناوی فیزیکزانی سویدی *Ångström* A. J.) ○ انگستروم

**angstrom unit** *noun*
(فیزیک) یەکەی ئەنگستروم (یەکەی درێژایی بەرامبەر بە $10^{10}$ میتر یان یان سەدملیۆن یەکی سانتی‌میتر) ○ واحد انگستروم

**Anguillan** /æŋ'gwɪlən/ *noun, adjective*

*n* خەڵکی ئانگویلا Anguilla دورگەیێکی نێو دورگە کانی Leeward *adj* سەربە یان پێوەندی بە ئانگویلاوە هەیە ۞ آنگویلایی

**anguilliform** /aŋˈgwɪlɪfɔːm/ *adjective*
(گیانەوەرناسی) شێوەمارماسی، مارماسی‌ئاسا ۞ مارماهی‌مانند

**anguish** /ˈæŋgwɪʃ/ *noun*
1 دڵەڕاوکێ، نیگەرانی، دڵتەنگی، دڵەخورپێ، شڵەژاوی 2 ئازار، ژان، دەرد، ئەشکەنجە ۞ 1 اضطراب، تشویش، دلواپسی 2 عذاب، زجر

**anguished** *adjective*
ئارام‌لێ‌هەڵگیراو، نیگەران، بەدڵەخورپێ ۞ مضطرب، مشوش

**angular** /ˈæŋgjələ(r)/ *adjective*
1 گۆشەیی، گۆشەدار، بەسووچ 2 کز، داڵگۆشت، ڕەقەڵ، نووک‌تیژ ۞ 1 زاویه‌ای، گوشه‌دار 2 لاغر

**angular cutter** *noun*
(میکانیک) گۆشەبڕ ۞ قطع‌کننده‌ی زاویه

**angular distance** *noun*
(بیرکاری) مەودا یان دووری گۆشەیی ۞ مسافت زاویه‌ای

**angularity** *noun*
گۆشەداربوون، گۆشەداریتی ۞ زاویه‌دار بودن

**angular momentum** *noun*
تەوژم یا مۆمێنتۆمی گۆشەیی ۞ گشتاور زاویه‌ای

**angular velocity** *noun*
خێرایی گۆشەیی ۞ سرعت زاویه‌ای

**angulate** *adjective*
گۆشەدار، گۆشەگۆشە ۞ مزوی

**angulation** *noun*
گۆشاندن، بەگۆشەدەرهێنان، پێکهێنانی گۆشە ۞ تشکیل زاویه

**Angus** /ˈaŋgəs/ = Aberdeen Angus

**angusti-** *prefix*
پێشگر: باریک، تەنگ، تەسک ۞ پیشوند: باریک

**anhedonia** /ˌanhɪˈdəʊnɪə/ *noun*
ناتوانێ هەست بە خۆشی بکا، بێ‌خۆشی (anhedonic *adj*) ۞ انهدونیا

**anhedral** /anˈhiːdr(ə)l, US -ˈhɛd-/ *adjective*
(زۆرتر زەوی‌ناسی، بلووری) بێ‌ڕوو، بێ‌لا ۞ انهدرال

**anhydride** /anˈhʌɪdrʌɪd/ *noun*
(کیمیا) 1 ناناوی، ئەنهایدرایدر: ئاوێتەیێ کە بەهۆی لابردنی توخمەکانی ئاو لە ترشەڵۆکێکی تایبەتی‌یەوە بە دەست هاتووە: *acetic -hydride* 2 ئاوێتەیێ کە لەو ئاوە وەرگیراوە ۞ انیدرید

**anhydrite** /anˈhʌɪdrʌɪt/ *noun*
ئەنهایدرایت: کانێکی سپی کە لە سولفاتی کالسیۆمی بێ‌ئاو پێکهاتووە $CaSO_4$ ۞ انیدریت

**anhydrous** /anˈhʌɪdrəs/ *adjective*
(کیمیا) ناناو، بێ‌ئاو، ئەنهایدرۆس، ناوی هیچ تیانیە ۞ انیدروس

**ani** /ˈɑːni/ *noun, pl.* anis
باڵندەیێکی کلک‌درێژی ڕەشی ورشن، لە تیرەی cuckoo، لە ئەمریکای ناوەندی و باشووری دەبینرێ [توخم *Crotophaga*: سێ جۆرن] ۞ آنی

**anil** *noun*
1 جۆرێ دەوەنی هیندی ڕۆژاوا West Indian لە خێزانی legume، هێشووە گوڵی زەردی سووروباوی چکۆلەی هەیە [ *Indigofera suffruticosa*] 2 شینی توند یان تۆخ ۞ 1 آنیل 2 آبی سیر

**anile** /ˈænaɪl, US ˈeɪnaɪl/ *adjective*
جوریاو، پیرێژنانە، پیرەژن‌ئاسا ۞ پیرزنانه

**aniline** /ˈanɪliːn, US -lɪn/ *noun*, also anilin
(کیمیا) ئەنیلین، جەوهەر: شلەیەکی ژاراوی، چەور و بێ‌ڕەنگ $C_6H_5NH_2$، ب.ت. بەهۆی لێ‌کردنەوەی nitrobenzene بە دەس دێنرێ و زۆرتر لە سازاندنی ڕەنگ و دەرمانەکان بەکاردێنرێ ۞ آنیلین

**aniline black** *noun*
(کیمیا) ڕەشی ئەنیلینی ۞ سیاه آنیلینی

**aniline dye** *noun*
ڕەنگی ئەنیلین ۞ رنگ آنیلینی

**aniline point** *noun*
(کیمیا) خاڵی جەوهەری یان ئەنیلین ۞ نقطه‌ی آنیلینی

**anilingus** /ˌeɪnɪˈlɪŋgəs/ *noun*
بزواندنی سێکسی کۆم بە پیاهێنانی زمان، کۆم‌لێسی ۞ آنیلینگوس

**anility** /ˈeɪnɪlətɪ/ *noun*
جوریاوی، خەرەفاوی، گەوجێتی ۞ خرف

**anima** /ˈanɪmə/ *noun, pl.* animas
1 گیان، ڕۆح 1-2 (لە دەروون‌ناسی یونگدا) بەشی مێینەی کەسایەتی پیاوێ (لە بەرامبەر animus دا) 2-2 کەسایەتی نێوەکی (لە بەرامبەر persona دا؛ بنەڕەت: لە لاتینەوە "mind"، "soul") ۞ 1 روح 1-2 و 2-2 انیما

**animadversion** *noun*
لێ‌گرتن، عەیب‌لێ‌گرتن، ئیرادگرتن، ئیرادگیری، ڕەخنەکردن، ڕەخنەگری ( animadversional *adj*) ۞ خرده‌گیری، عیب‌جویی

**animal** /ˈænɪml/ *noun, adjective*
*n* 1 گیان‌لەبەر، ڕۆح‌لەبەر، ئاژەڵ، گیانەوەر، گیان‌دار، ژین‌دار، جانەوەر، زیندەوەر، بوونەوەر 2 گیانەوەری چوارپێ 3 مرۆڤی دڕندە *adj* 1 گیانەوەری 2 لەشی، جەستەیی، تەنانی ۞ *n* 1 جانور، حیوان، موجود 2 حیوان چهارپا 3 انسان وحشی *adj* 1 حیوانی 2 جسمانی

**animal charcoal** *noun*
خەڵووزی گیانەوەری ۞ زغال حیوانی

**animalcular** *adjective*
سەربە گیانەوەری میکرۆسکۆپی، گیانەوەرۆچکەیی، وردەگیانەوەری ۞ وابستە بە جانور ذرەبینی

**animalcule** /ˌanɪˈmalkjuːl/ *noun,* also animalculum
(کۆن) گیانەوەری میکرۆسکۆپی، گیانەوەرۆچکە، وردەگیانەوەر، وردەجانەوەر (ئەمیب، میکرۆب) ۞ جانور ذرەبینی

**animal fat** *noun*
چەوری گیانەوەری، پیو، بەز ۞ چربی حیوانی

**animal genetics** *noun, pl.*
بۆماوەناسی یان ژێنێتیکی گیانەوەری ۞ ژنتیک حیوانی

**animal geography** *noun*
جوگرافیای گیانەوەری ۞ جغرافیای حیوانی

**animal heat** *noun*
گەرمی گیانەوەری ۞ حرارت حیوانی

**animal husbandry** *noun*
ئاژەڵ بەخێوکردن، ئاژەڵداری، ئاژەڵ‌ڕاگرتن ۞ دامپروری

**animalism** *noun*
گیانەوەرگەری، ئەنیمالیزم، گیانەوەرپەرستی ۞ اصالت حیوانی

**animalistic** *adjective*
سەربە گیانەوەرگەری، ئەنیمالیستی ۞ وابستە به اصالت حیوانی

**animality** /ˌænɪˈmælɪtɪ *noun*
گیانەوەریێتی، ژیان یان سروشتی گیانەوەری، دنیا یان جیهانی گیانەوەران ۞ حیوانیت، عالم حیوانات

**animalization** *noun*
بوونەگیانەوەر، گیانەوەراندن ۞ حیوان‌شدگی، آنیمالیزاسیون

**animal kingdom** *noun*
جیهان یا دنیای گیانەوەران، مەڵبەندی گیانەوەران (لە بەرامبەر vegetable kingdom و mineral kingdom) ۞ عالم حیوانات

**animal liberation** *noun*
ئازادکردن یان زرگارکردنی گیانەوەری (لە چەوسانەوە و جووڵانەوەر خراپ لە لایەن مرۆڤەوە) ۞ آزادسازی حیوانات

**animal liberationist** *noun*
رزگاریخوازی گیانەوەری ۞ آزادساز حیوانات

**animal life** *noun*
ژیوار یان ژیانی گیانەوەری ۞ زندگی جانوری

**animal magnetism** *noun*
هیپنۆتیزم، راکێشانی رەگەزی یان سێکشواڵی گیانەوەران ۞ هیپنوتیزم، جاذبەی جنسی حیوانات

**animal migration** *noun*
کۆچی گیانەوەری ۞ مهاجرت جانوری

**animal oil** *noun*
رۆنی گیانەوەری، پیو، بەز ۞ روغن حیوانی

**animal parasite** *noun*
مشەخۆری گیانەوەری ۞ انگل جانوری

**animal phylum** *noun*
لقی گیانەوەری ۞ شاخەی جانوری

**animal physiology** *noun*
کارئەندامناسی یان فیزیۆلۆژی گیانەوەری ۞ فیزیولوژی جانوری

**animal plankton** *noun*
سەراوەکی یان پلانکتۆنی گیانەوەری ۞ پلانکتون جانوری

**animal population** *noun*
حەشیمەتی گیانەوەری ۞ جمعیت جانوری

**animal protection** *noun*
پاراستنی گیانەوەری یان گیانەوەران ۞ حفاظت از جانوران

**animal protein** *noun*
پرۆتئینی گیانەوەری ۞ پروتئین جانوری

**animal soap** *noun*
سابوونی گیانەوەری یان پیوی ۞ صابون حیوانی

**animal society** *noun*
کۆمەڵ یان کۆمەڵگای گیانەوەری ۞ جامعەی جانوری

**animal species** *noun*
جۆری گیانەوەری ۞ گونەی جانوری

**animal spirit** *noun*
خۆشی سروشتی ژیان، تین‌وگوری ژیان ۞ لذت طبیعی زندگی

**animal starch** *noun,* also glycogen
نشاستەی گیانەوەری، گلیکۆژین ۞ نشاستەی جانوری

**animal tax** *noun*
کۆدە، باج یان بازی مالات، مالاتانە، ئاژەڵانە ۞ مالیات حیوان

**animal toxin** *noun*
ژار یان ژاراوکی گیانەوەری ۞ سم جانوری

**animal virus** *noun*
ڤایرۆسی گیانەوەری ۞ ویروس جانوری

**animal world** *noun*
دنیای گیانەوەری، جیهانی گیانەوەران ۞ عالم حیوانات

**animate** /ˈænɪmət/ *adjective*
گیان‌دار، بەگیان، رۆح‌لەبەر، زیندەوەر، رۆح‌دار، زیندوو، alive: *an -mate noun* (animatedly *adv* ،animateness *n*) ۞ ذی‌روح

**animated** /ˈænɪmeɪtɪd/ *adjective*
1 گەرم، سەرنج‌ڕاکێش، بەکەیف، بەگور، سەرخۆش 2 (وێنەکێشی) جووڵاو: *an -mated film* ۞ 1 داغ، سرزندە، بانشاط 2 متحرک

**animated cartoon** *noun*

کارتون، وێنەکێشی جوولاو ۞ کارتون

**animatedly** /'ænɪmeɪtɪdli/ *adverb*
بە سەرخۆشی‌یەوە، بەگوڕەوە، بە کەیفەوە ۞ با سرزندگی

**animated stick** *noun*
جۆری stick insect ی ڕۆژهەڵاتی ئەوستراليا، جاروبار لەباری درێژایی‌یەوە دەگاتە 25 سانتی‌میتر [*Acrophylla titan*] ۞ نوعی حشره

**animation** /ˌænɪ'meɪʃn/ *noun*
1 سەرخۆشی، بەکەیفی، بەدەماخی، کەیف‌سازی، تین‌وگوڕ، بەگوڕی، چالاکی، بەدەماخی 2 وێنەجوولێنی، ئەنیمەیشن، بەرهەمهێنانی وێنەکێشی جوولاو ۞ 1 سرزندگی، شور و نشاط 2 متحرک‌سازی، پویانمایی

**animator** /'ænɪmeɪtə(r)/ *noun*
1 وێنەجوولێن، ئەنیمەیتێر 2 گیان‌بەبەرداکەر، گیان‌دەر، گیان‌بەخش ۞ 1 پویانما، متحرک‌ساز 2 حیات‌بخش

**animatronics** /ˌænɪmə'trɒnɪks/ *noun, pl.*
تەکنیکی دروست‌کردن یان کارپێ‌کردنی ڕۆبۆتە زیندوودیارەکان، ب.ت. بۆ بەکارهێنانیان لە فیلمدا (animatronic *adj*) ۞ انیماترونیک

**anime** /'ænɪmeɪ, US 'ænɪmə/ *noun*
ئانیمی: ئەنیمەیشنی فیلم و تەلەفزیۆنی ژاپۆنی، ب.ت. بە تێمێکی زانستی خەیاڵی‌یەوە ۞ آنیمی

**animism** /'ænɪmɪzəm/ *noun*
1 گیان‌باوەڕی، ڕۆح‌باوەڕی، باوەڕ بە گیان‌داربوونی شتەکان (وەک دیاردە سروشتی‌یەکان، ڕووەک و هتد) 2 بەگیان‌دارزانی، گیان‌مەندباوەڕی، بەزیندەزانی، زیندەباوەڕی ۞ 1 روح‌گرایی 2 زنده‌انگاری

**animist** /'ænɪmɪst/ *noun*
گیان‌باوەڕ، ڕۆح‌باوەڕ ۞ روح‌گرا

**animistic** /ˌænɪ'mɪstɪk/ *adjective*
گیان‌باوەڕانە، سەربە گیان‌باوەڕی، ڕۆح‌باوەڕی‌یانە ۞ روح‌گرایانه

**animosity** /ˌænɪ'mɒsəti, US -'mɑːs-/ *noun, pl.* animosities
دوژمنی، دوژمنایەتی، نەیاری، ڕق‌وکینە، قینەبەرایەتی، ڕقەبەرایەتی ۞ خصومت، دشمنی

**animus** /'ænɪməs/ *noun*
1 دوژمنی، دوژمنایەتی، قینەبەرایەتی، غەرەز، ڕق، قین، نەیاری، بێزاری 2 (لە دەروون‌ناسی یۆنگدا) بەشی نێرینەی کەسایەتی ژن (لە بەرامبەری anima دا) ۞ 1 خصومت، عناد، غرض، انزجار 2 انیموس

**anion** /'ænaɪən/ *noun*
(کیمیا) ئانیۆن (ئایۆنی بارگاوی charged نەرێنی، دژی cation؛ anionic *adj*: ئانیۆنی، سەربە یان پێوەندی بە ئانیۆنەوە هەیە) ۞ آنیون

**anis- or aniso-** *prefix*
پێشگر: جیاواز، جیا، نابەرامبەر، جودا: *anisogamous*، *anisotropic* (بنەڕەت: لە *anisos* یۆنانی‌یەوە "unequal") ۞ پیشوند: متباین

**anise** /'ænɪs/ *noun*
1 ڕەزیانە [*Pimpinella anisum*] 2 بۆ ناوی ئەو دار یا دەوەنە ئەمریکایی یان ئاسیایی بەکاردێتری کە میوەیێکی وا بە بۆنی تووی ڕەزیانەوە دەگرن، ب.ن. star anise [تۆخم *Illicium*] (بنەڕەت: بە ڕێگای فەرەنسی کۆن لە *anisum* لاتین، لە *anison* یۆنانی "anise، dill") ۞ 1 رازیانه 2 آنیس

**aniseed** /'ænəsiːd/ *noun*
دان یان تووی ڕەزیانە ۞ تخم رازیانه

**anisette** /ˌænɪ'zet/ *noun*
ئارەق یان مەی ڕەزیانە، ڕەزیانک ۞ انیست

**Anishinabe also Anishinaabe or Anishinabeg** = Ojibwa1

**anisogamous** *adjective*, also anisogamic
(ڕووەک‌ناسی) ناهاوجووت، نابەرامبەرجووت ۞ انیسوگاموس

**anisogamy** /ˌænaɪ'sɒgəmi/ *noun*
(ڕووەک‌ناسی) ناهاوجووتی، نابەرامبەرجووتی، زۆربوونی ڕەگەزی بەهۆی یەک‌گرتنی گامێتە جیاواز یان لێک‌نەچووەکان (بڕوانە isogamy) ۞ انیسوگامی

**anisole** *noun*
ئانیسۆل، ئەنیسۆل: جۆری شلەی ئاوەتوواوی ئارۆماتیک $C_7H_8O$، ب.ت. لە بواری گوڵاوسازی‌دا بەکاردێتری ۞ انیسول

**anisometric** *adjective*
جیابەش، بەش‌بەش، (خاوەنی کۆمەڵە بەشێکی) ناهاوتا ۞ متباین‌الاجزا

**anisometropia** *noun*
ئەنیسومێترۆپیا، تێک‌چوونی توانایی شکانەوە لە هەر دوو چاودا، توانایی شکانەوەی نابەرامبەر لە هەردوو چاودا، جیاوازی دید یان بینایی دوو چاو ۞ انیسومتروپیا

**anisometropic** *adjective*
ئەنیسومێترۆپیک ۞ انیسومتروپیک

**anisophyllous** *adjective*
گەڵانابەرامبەر، گەڵاناڕێک: گەڵاکانی زیاتر لە دوو یان چەند ئەندازە و شێوەی هەیە ۞ انیسوفیلوس

**anisophylly** *noun*
گەڵانابەرامبەری، گەڵاناڕێکی ۞ انیسوفیلی

**anisoploid** *adjective*
ئەنیسۆپلۆ(ئ)ید: ئەو زیندەوەرانەی کە زنجیرە ڕەنگ‌تەن یان کرۆمۆزۆمێکی تاکیان هەیە ۞ انیسوپلوئید

**anisoploidy** *noun*
ئەنیسۆپلۆ(ئ)یدی ۞ انیسوپلوئیدی

**Anisoptera** /ˌanʌɪˈzɒptərə/ *noun, pl.*
(میروناسی) ناهاوبالان، نابەرامبەربالان، ناهاویەلان: ژێردەستەیێ لە مێرووەکان کە dragonfly ـەکان دەگرێتەوە ۞ انیسوپترا

**anispteran** *noun, adjective*
(مێرووی) ناهاوبال یان نابەرامبەربال ۞ انیسوپتران

**anisotropic** /ˌanʌɪsə(ʊ)ˈtrɒpɪk/ *adjective*
(فیزیک) چەندلاخواز، نائیزۆترۆپیک، ئەنیسۆترۆپیک، نارێک، خاوەنی تایبەتمەندی جیاواز لە کۆمەڵە لایێکی جیاوازەوە ۞ انیسوتروپیک

**anisotropically** /ˌanʌɪsə(ʊ)ˈtrɒpɪkli/ *adverb*
چەندلاخوازانە، لەباری نائیزۆترۆپیک ۞ از لحاظ انیسوتروپیک

**anisotropy** /-ˈsɒtrəpi/ *noun*, also anisotropism
چەندلاخوازی، نائیزۆترۆپی، ئەنیسۆترۆپی، نارێکی ۞ انیسوتروپی

**Anjou** *noun*
جۆرێ هەرمێی هێلکەیی شیرین و گەورە ۞ نوعی گلابی

**ankerite** *noun*
جۆرێ کانی کاربۆنات کە پێوەندی بە dolomite ـەوە هەیە، بەلام لەودا ئاسن بەشێکی لە مەنیزیۆم داگرتووە (بنەڕەت: لە ناوی کانیناسی ئەوستریایی *M. J. Anker* (مەرگ 1843)+ ite) ۞ انکریت

**ankh** /æŋk/ *noun*
خاچی ئالقەدار یان قولفن (یان قولفدار، ب.ت. لە میسری کۆندا، ب.ت. وەک نیشانەی ژیان) ۞ انک

**ankle** /ˈæŋkl/ *noun*
قولەپێ، قولاپە، قولەپا، گوێزینگ، گۆزینک، قول (ankled *adj*؛ ئەڵمانی بنەڕەت) ۞ قوزک

**ankle-biter** *noun*
(ئەوسترالیا و نیوزیلەند، بۆ شۆخی) منال ۞ بچە

**ankle bone** *noun*
(توێکاری) ئێسکی گوێزینگ یان قولەپێ، دەق، قاپ، talus ۞ استخوان قوزک

**ankle-joint** *noun*
خرتکە، خرکە ۞ بند

**ankle socks** *noun*
گۆرەوی ملکورت، گۆرەوی قولەپێ یان قولەپا ۞ جوراب ساق‌کوتاه

**anklet** /ˈæŋklət/ *noun*
پاوانە، پێوەند، خرخال (خاشخاش: پاوانەی زەنگولەیی) ۞ خلخال

**ankylosaur** /ˈaŋkɪləsɔː/ *noun*
جۆرێ دایناسۆری چوارپێی گیاخۆری کەتەی سەردەمی کرێتاسە Cretaceous (بنەڕەت: لە لاتین *Ankylosaurus*، لە یۆنانی *ankulos* (بڕوانە ankylosis) + *sauros* "lizard") ۞ نوعی دایناسور

**ankylosing spondylitis** *noun*
(پزشکی) جۆرێ جومگەئاوسێی بڕبڕەیی spinal arthritis (بڕوانە spondylitis) ۞ جمود مفصل

**ankylosis** /ˌaŋkɪˈləʊsɪs/ *noun, pl.* ankyloses
(پزشکی) رەقبوون و نەگەڕانی نائاسایی جومگەیێ بەهۆی یەکگرتنی ئێسکەکان، جومگەڕەقە ۞ جمود مفصل

**ankylostomiasis** /ˌaŋkɪlə(ʊ)stə(ʊ)ˈmʌɪəsɪs/ = ancylostomiasis

**anlage** /ˈanlɑːgə/ *noun, pl.* anlagen /ˈʌnə/ or anlages
(زیندەناسی، ئەڵمانی) بنواشە: بنەڕەت و بنچینەی ئەندامێکی تایبەتی یان بەشێکی تر، ب.ت. ناوەڵمەیێ، ب.ت. primordium ۞ آنلاگ

**anna** /ˈʌnə/ *noun*
1 ئانا: یەکەی بنەڕەتی پارە لە بورما Burma هیند و پاکستان، بەرامبەر بە شازدەیەکی rupee (بنەڕەت: لە *ānā* هیندییەوە) 2 (Anna) نەنکی عیسا ۞ انا

**annal** /ˈæn(ə)l/ *noun*
ساڵنامە، تۆماری ڕووداوەکانی ساڵێ ۞ وقایع‌نامه

**annalist** /ˈænəlɪst/ *noun*
ڕووداونووس، ساڵنامەنووس، ساڵنامەوان، chronicler ۞ وقایع‌نگار

**annalistic** *adjective*
سەربە ڕووداو(نامە)نووسی، ساڵنامەنووسی ۞ وابسته به وقایع‌نگاری

**annals** /ˈænlz/ *noun, pl.*
(ساڵ بە ساڵ) ساڵنامە، ڕووداونامە، تۆمارنامە، مێژوونامە، مێژوو، تۆمارە مێژوویییەکان ۞ شرح وقایع سالیانه، تاریخچه

**Annamese** *noun, adjective, pl.* same
*n* 1 خەڵک یان دانیشتووی Annam = 2 Vietnamese (ڕووبەری خاکەکەی 148,200 *sq km*) *adj* 1 ئانامی 2 سەربە ئانام ۞ آنامی

**annatto** /əˈnatəʊ/ *noun*, also anatto
1 ڕەنگێ کە لە توێخی دەنکی میوەیێکی گەرمێنان دەگیرێ و بۆ ڕەنگاندنی خۆراک 2 درایکی ئەمریکایی گەرمێنان ۞ آناتو

**annealer** *noun*
کلێنەر، ڕەقێنەر، ناوەدەرەوە، جەوهەردەر ۞ تابکار

**annealing** *noun*
کلاندنەوە، ڕەقکردنەوە یان ڕەقاندن بەهۆی هێواش ساردکردنەوە دوای گەرمکردن، سووکەساردکردنەوە، سووکەسارداندن،

رەقاندنەوە، ئاودانەوە، جەوهەردان ◌ تابکاری

**annelid** /'an(ə)lɪd/ *adjective, noun*
(کرمی) ئالقەیی یان بازنۆکەیی ◌ (کرم) حلقوی

**Annelida** /ə'nelɪdə/ *noun, pl.*
(گیانەوەرناسی) کرمە ئالقەیییەکان، بازنۆکەیییەکان: لقێکی بەربلاو کە کرمە برگەبرگە یان کەرتکەرتەکان segmented worm دەگرێتەوە کە earthworm ـەکان، lugworm ـەکان، ragworm ـەکان و leech ـەکان (بنەڕەت: لە لاتینی نوێوە، لە فەرەنسی *(animaux) annelés* "(گیانەوەرە) ئالقەئالقەکان"، لە *anel* فەرەنسی کۆن "ئالقەیی"، لە *anellus* لاتین، چکۆلێنراوی *anulus* "بازنەیی، ئالقەیی") ◌ کرمهای حلقوی

**annelidan** *noun, adjective*
(کرمی) ئالقەیی یا بازنۆکەیی ◌ (کرم) حلقوی

**annex** /'æneks/ *noun*, chiefly Brit. also annexe /'æneks/, *pl.* annexes
1 لاخانوو(بەرە)، دەستەی لا(پاڵ)، لادەستە، خانووبەرەی سەرخستە یان لکاو، خانووبەرەی سەرخراو (نووساوە بە خانووبەرەی سەرەکی) 2 پاشکۆ، سەرخستە ◌ 1 ساختمان فرعی 2 ضمیمه

**annexation** /,ænek'seɪʃn/ *noun*
1 داگیرکردن، دەسبەسەراگرتن، گرتن، زەوتکردن 2 لکاندن، خستنەپاڵ، دانەدەم، خستنەسەر 3 پاشکۆ، سەرخستە ◌ 1 تصرف، اشغال 2 الحاق، ضمیمەسازی 3 ضمیمه

**annexment** *noun*
پاشکۆ، پالخستە، سەرخستە ◌ ضمیمه

**annihilable** /ə'naɪələbl/ *adjective*
لەقەلاچۆهاتوو، تێکدەشکێ، لەنێودەچێ، دەفەوتێ ◌ نابودشدنی

**annihilation** /ə,naɪə'leɪʃn/ *noun*
1 لەنێوچوون، تیاچوون، وێرانی، کاولبوون، قەلاچۆ، فەوتاندن، نەهێشتن، کوێرکردنەوە، خاپووربوون، قڕ، قڕتێکەوتن، تەختوبەختبوون، پاکتاوبوون، هەڵتەکان 2 بەزین، شکست، تێشکان (یەکجاری) 3 نەمان ◌ 1 فنا، نابودی 2 انهدام، شکست 3 نیستی

**annihilator** *noun*
تیابەر، وێرانکەر، خاپوورکار، فەوتێنەر، کاولکەر، تێکشکێنەر، هەڵتەکێنەر ◌ نابودگر، ویرانگر

**anniversary** /,ænɪ'vɜːsəri, US -'vɜːrs-/ *noun, pl.* anniversaries
ساڵگەڕانەوە، ساڵوەگەڕ، ساڵیاد، ساڵەوەختینە، ساڵگەڕ، ساڵڕۆژ: *the 6-month -niversary of the accident* ◌ سالگرد، سالروز

**Anno Domini** /,anəʊ 'dɒmɪnʌɪ/ *noun, abbreviation* AD
زایینی، پاشزایین، دوای زایین ◌ میلادی، پس از میلاد

**Anno Hegirae** *noun*
کۆچی ◌ هجری

**annotated** /'ænəteɪtɪd/ *adjective*
پەراوێزلەگەڵ، لەگەڵلێکدانەوە: *an -otated edition* ◌ همراه با حواشی

**annotation** /,ænə'teɪʃn/ *noun*
ڕوونکردنەوە، لێکدانەوە، ڕاڤەکردن، پەراوێز، پەراوێزنووسی: *It will be published with annotations and an index ◊ The new edition is based on previously unpublished manuscripts with full -notation* (annotative: *adj*) ◌ توضیح، تفسیر، حاشیه، حواشی‌نگاری

**annotator** /'ænətɪtə(r)/ *noun*
پەراوێزنووس، لێکدەرەوە ◌ حواشی‌نگار

**announcement** /ə'naʊnsmənt/ *noun*
ڕاگەیاندن، دانەزانین، بلاوکاری، بلاوکردنەوە، ئاگاداری، ئاگاهی، بانگەواز، جاڕ، بلاوکراوە، هەواڵ: *Announcement of the verdict was accompanied by shouts and cheers ◊ a formal/an official/a public -nouncement* ◌ اعلام، اعلان، آگهی، اطلاعیه، خبر

**announcer** /ə'naʊnsə(r)/ *noun*
بێژەر، بلاوکار، ڕاگەیێنەر، بانگەوازچی، بانگەوازکەر (بە سپیکێر) ◌ گوینده، اعلام‌کننده

**annoyance** /ə'nɔɪəns/ *noun*
1 نارەحەتی، ڕقهەستاوی، تووڕەیی 2 دڵئێشان، زیزی، دڵشکان، دڵڕەنجان 3 تەنگەتاوکردن، سەرئێشاندن، هەراسانکردن، بەتەنگهێنان، جاڕزکردن، نارەحەتکردن، دەردپێدان، هەڵپێچان، زۆربۆهێنان، بێزارکردن 4 مایەی مزاحیمبوون، مایەی سەرئێشە ◌ 1 ناراحتی، عصبانیت 2 رنجش 3 مزاحمت، اذیت 4 تصدیع، اسباب دردسر

**annoyed** /ə'nɔɪd/ *adjective*
نارەحەت، جاڕز، زوێر، دڵگیر، عاجز، تووڕە، زیز، دڵئێشاو، دڵمەند ◌ ناراحت، عصبانی، دلخور

**annoying** /ə'nɔɪɪŋ/ *adjective*
نارەحەتکەر، دڵڕەنجێن، ناخۆش، دڵشکێن، ڕقهەستێن، دڵسووتێن، وەڕەسکەر، تەنگپێهەڵچن (annoyingly /ə'nɔɪɪŋli/ *adv*: بەشێوەیەکی نارەحەتکەر، وەڕەزکەرانە) ◌ ناراحت‌کننده، عصبانی‌کننده

**annual** /'ænjuəl/ *adjective, noun*
1 *adj* ساڵانە، ساڵی، ساڵیانە، یەکساڵە، هەر ساڵ: *an annual meeting/event/report ◊ an annual income/subscription/budget* 2 *an average annual growth rate of 8%* یەکساڵە، یەکساڵەزی (بڕوانە biennial، perennial) 1 *n* ساڵنامە، کتێب یان کۆڤاری کە

سالی جاری دەردەچێ 2 ڕووەک یان گیای یەکساڵە (بنەڕەت: لە *annuel* فەرەنسی کۆن، لە late Latin *annualis* لە *annus* "ساڵ") ۞ *adj* 1 ساڵانە، سالیانە، ساڵی یەک بار 2 یەکساڵە *n* 1 سالنامە 2 گیاه یکسالە

**annual budget** *noun*
دراونامە یا بوودجەی ساڵانە ۞ بودجەی سالانه

**annual expense** *noun*
خەرج یان تێچوونی ساڵانە ۞ هزینەی سالانه

**annual general meeting** *noun*
کۆبوونەوەی گشتی ساڵانە ۞ همایش عمومی سالانه

**annually** /'ænjuəli/ *adverb*
لە ساڵدا، ساڵبەساڵ، هەر ساڵە، ساڵانە ۞ سالانه، هر ساله

**annuitant** /ə'nju:ɪt(ə)nt/ *noun*
مووچەخۆر، ساڵانەگر ۞ حقوق‌بگیر

**annuity** /ə'nju:əti, US -'nu:-/ *noun, pl.* annuities
بڕانەی ساڵانە، ساڵانە، بیمەی مووچەی ساڵانە، حەق و مافی وەرگرتنی بڕانەی ساڵانە ۞ مستمری سالیانه، آنوایتی

**annular** /'ænjələ(r)/ *adjective*
ئاڵقەیی، بازنەیی، شێوەبازنە، ئاڵقەئاسا، شێوەئاڵقە، چەمەری، خڕ، گروفەری، خەلەکی (annularly *adv*) ۞ حلقوی، حلقه‌مانند، حلقه‌وار

**annular eclipse** *noun*
خۆرگیرانی بازنەیی یا ئاڵقەیی ۞ کسوف حلقوی

**annulary** *adjective*
ئاڵقەدار، بازنەدار، بازنەبازنە، ئاڵقەئاڵقە، ئاڵقاوی ۞ حلقه‌دار

**annulate** /'anjolət/ *adjective, also* annulated
ئاڵقەدار، بازنەدار، بازنەبازنە، ئاڵقەئاڵقە، ئاڵقاوی ۞ حلقه‌دار

**annulation** /ˌænjo'leisən/ *noun*
دروس‌بوونی بازنە، سازبوونی ئاڵقە، ئاڵقەئاڵقە پێکهاتن، پێکهێنان یان دروستکردنی ئاڵقە، پێکهاتەیێکی ئاڵقەئاسای توێکاری ۞ تشکیل حلقه

**annulet** /'anjolɪt/ *noun*
بازنۆکە، ئاڵقۆچکە، چەمەرۆکە، بازنەی چکۆلانە ۞ حلقەی کوچک

**annulment** /ə'nəlmənt/ *noun*
هەڵوەشاندنەوە، هەڵوەشاندن، پووچەڵ کردنەوە، بەتاڵ کردنەوە، پووکاندنەوە ۞ الغا، ابطال، فسخ

**annulose** *adjective*
بازناوی، ئاڵقاوی، ئاڵقەئاڵقە، لەبازنەپێکهاتوو، بازنەبازنە ۞ انیولوس

**annulus** /'anjʊləs/ *noun, pl.* annuli /-lʌɪ, -li:/
پێکهاتە، شت یان ناوچەیێکی بازنەیی (یان ئاڵقەیی؛ بنەڕەت: لە *anulus*، *annulus* لاتین) ۞ ساختار، چیز یا منطقه‌ای حلقه‌ای‌شکل

**the Annunciation** /əˌnʌnsi'eɪʃn/ *noun*
1 دانەزانین، ڕاگەیاندن، بلاوکاری 2 مزگێنی، مژدە 3 جێژنی مزگێنی (لە 25ی مارسدا) ۞ 1 اعلام 2 بشارت 3 عید بشارت

**annunciator** /ə'nʌnsieɪtə(r)/ *noun*
ڕاگەیێنەر، ڕاگەیەنەر ۞ اعلام‌کننده

**annus horriblis** /ˌanəs hɒ'ri:bɪlɪs/ *noun*
ساڵی نەهات(ی)، ساڵی ڕەش یان نەهامەتی، ساڵی مەینەتی یان بێبەختی ۞ سال بدبختی

**annus mirabilis** /mɪ'rɑ:bɪlɪs/ *noun*
ساڵی هات، ساڵی پڕبیت، ساڵی سەیر ۞ سال پربرکت

**anoa** /ə'nəʊə/ *noun, pl.* same or anoas
(گیانەوەرناسی) گامێشێکی ئاوی چکۆلەی گاکێویئاسا، ڕەسەنی Sulawesi [تۆخم *Bubalus*: دوو جۆرن] ۞ انوآ

**anodal** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە anode ـەوە هەیە ۞ وابسته به انود

**anode** /'ænəʊd, US 'ænoʊd/ *noun*
ژوورک(ە)، جەمسەری ئەرێنی، جەمسەری گەرم، ئانۆد، گەرمەجەمسەر (دژی cathode؛ anodic *adj*: سەربە ژوورک یان ئانۆد) ۞ انود

**anodyne** /'ænədaɪn/ *noun*
1 دەرمانی ژانبڕ، دەرمانی ئارامکەرەوە 2 شتی دامرکێن، هێورکەرەوە، دڵدەرەوە، خەمڕەوێن ۞ 1 داروی مسکن 2 عامل تسکین‌دهنده

**anogenital** /ˌeɪnəʊ'dʒɛnɪt(ə)l/ *adjective*
(پزشکی و توێکاری) سەربە کۆم و ئەندامانی زاوزێ ۞ آنوجنیتال

**anointing of the sick** = extreme unction

**anointment** *noun*
چەورکردن، (مەرهەم) پیاماڵین یان پیاساوین (ب.ت. لە ڕێوڕەسمی دینیدا) ۞ پمادمالی

**anole** /ə'nəʊli/ *noun*
جۆرێ مارمێلکەی چکۆلەی دار(نشین)ی ئەمریکایی، زۆرتر بە ڕەنگی ڕۆشن [تۆخم *Anolis*] (لە کارائیبەوە) ۞ آنول

**anomalous** /nɒmələs, US -'nɑ:m-/ *adjective*
نائاسایی، سەیر، ڕیزبەر، بێڕێسا، نارێک، شێرزە، ئاڵۆز (anomalously /nɒmələsli, US -'nɑ:m-/ *adv*: نائاساییانە؛ anomalousness /nɒmələsnəs, US -'nɑ:m-/ *n*) ۞ غیرعادی، نابهنجار، نامنظم

**anomalous curve** *noun*
(کیمیا) چەماوەی نائاسایی ۞ منحنی غیرعادی

**anomalous effect** *noun*
(کیمیا) کاریگەری نائاسایی ۞ اثر غیرعادی

**anomaly** /ə'nɒməli, US ə'nɑːm-/ *noun*, *pl.* anomalies

1 ناناسایێتی، سەیربوون، نارێکی، بێ‌ڕێسایی، irregularity: *the many anomalies in the tax system* 2 شتێکی ناناسایی 3 دۆخی ناناسایی ۞ 1 نابهنجاری، بی‌نظمی 2 چیز غیرعادی 3 وضع غیرعادی

**anomia** /ɔ'nəʊmɪə/ *noun*

(پزشکی) جۆرێ aphasia کە نەخۆش ناتوانێ شتەکانی ڕۆژانەی بێنێتەوە بیر (anomic *adj*: تووش‌بوو بە نەخۆشی ئانۆمیا) ۞ آنومیا

**anomie** /'ænəmi/ *noun*, also anomy

(کۆمەڵناسی) ئەنامی، شێواوی کۆمەڵایەتی، بێ‌ڕێسایی (anomic /ə'nɒmɪk/ *adj*: سەربە ئەنامی یان شێواوی کۆمەڵایەتی؛ بنەڕەت: لە فەرەنسی، لە *anomia* یۆنانی، لە *anomos* "lawless") ۞ هنجارگسیختگی

**anon** /ə'nɒn, US ə'nɑːn/ *adverb*

دەسبەجێ، لەڕێوە، زوو، بەزوویی، خێرا ۞ فوراً، به زودی

**anon** /ə'nɒn, US ə'nɑːn/ = anonymous

**anonym** /'ænənɪm/ *noun*

1 کەس یان بەرهەمی بێ‌ناو 2 نازناو، خوازەنێو، ناوی خوازراو ۞ 1 شخص یا اثر بی‌نام 2 مستعار

**anonymity** /ˌænə'nɪməti/ *noun*

نەناسراوی، بێ‌ناونیشانی، بێ‌ناوی، گومی، نەناس‌مانەوە، نەناسران، ناودەرنەکردوویی ۞ گمنامی، ناشناس ماندن

**anonymous** /ə'nɒnɪməs, US ɔ'nɑːn-/ *adjective*

1 نەناسراو، بێ‌ناونیشان، بێ‌ناو، گوم، ناودەرنەکردوو 2 ئاسایی (anonymously /ə'nɒnɪməsli, US ə'nɑːn-/ *adv*: بەشێوەیێکی نەناسراو، نەناسراوانە؛ anonymousness *n*) ۞ 1 گمنام ناشناس 2 معمولی

**anopheles** /ə'nɒfɪliːz/ *noun*, *pl.* same

کەلەمێش، هۆدرە، تەپۆ، مەلەشە [توخم *Anopheles*] (بنەڕەت: لە *anōphelēs* یۆنانی‌یەوە "بێ‌کارە، بەکارنەهاتوو، بێ‌خێرە") ۞ پشه‌ی مالاریا

**Anoplura** /ˌanə(ʊ)'plʊərə/ *noun*, *pl.*

(مێروناسی) ئەسپێیان، کلکبێ‌زرێ‌کان، کلکبێ‌زرێ‌یان: تیرە یان دەستەیێ لە مێرووەکان کە ئەسپێ مژۆک دەگرێتەوە (بنەڕەت: لە لاتینەوە: *anoplos* "unarmed" + *oura* "tail") ۞ آنوپلورا

**anopluran** *noun*, *adjective*

(مێروو) ئەسپێ، ئەسپێیی، کلکبێ‌زرێ ۞ آنوپلوران

**anorak** /'ænəræk/ *noun*

ئەنورەک، باڵتە، باگیر، باگێرەوە ۞ آنوراک، بادگیر

**anorectal** /ˌeɪnəʊ'rɛkt(ə)l/ *adjective*

(پزشکی و توێکاری) سەربە کۆم و ڕیخۆڵەڕاستە ۞ آنورکتال

**anorexia** /ˌænə'reksiə/ *noun*

1 دڵنەبردن، بێ‌ئیشتیایی 2 بێ‌ئیشتیایی دەروونی anorexia nervosa ۞ 1 بی‌اشتهایی 2 بی‌اشتهایی روانی

**anorexia nervosa** /ˌænəˌreksiə nɜː'vəʊʃə, US nɜːr'voʊsə/ *noun*, also anorexia

بێ‌ئیشتیایی دەروونی ۞ بی‌اشتهایی روانی

**anorexic** /ˌænə'reksɪk/ *adjective*, *noun*, also anorectic

*adj* تووش‌بوو بە بێ‌ئیشتیایی دەروونی *n* نەخۆشی تووش‌بوو بە بێ‌ئیشتیایی دەروونی ۞ *adj* مبتلا به بی‌اشتهایی روانی *n* بیمار مبتلا به بی‌اشتهایی روانی

**anorgasmia** /ˌanɔː'gazmɪə/ *noun*

(پزشکی) نەتوانینی هەمیشەیی بۆ بەدەس‌هێنانی ئۆرگازم سەرەڕای بزوانی ئارەزووی سێکسی (anorgasmic *adj*) ۞ آنورگازمیا

**anorthite** /ə'nɔːθʌɪt/ *noun*

ئانۆرتێت، ئانۆرتایت: کانێکی پڕکالسیۆم لە کۆمەڵی فێلدسپار، زۆرتر سپی (anorthitic *adj*: سەربە ئانۆرتێت یا ئانۆرتایت) ۞ آنورتیت

**anorthosite** /ə'nɔːθəsʌɪt/ *noun*

(زەوی‌ناسی) جۆرێ بەردی دان‌دانی ئاگرین کە زۆرتر لە labradorite یان plagioclase ی تر پێکهاتووە (anorthositic *adj*) ۞ آنورتوسیت

**anosmia** /a'nɒzmɪə/ *noun*

بۆن‌پێ‌نەکراوی یان بۆن‌پێ‌نەکران، بۆن‌نەکردن، نەمانی هەستی بۆن‌کردن (لەبەر برین‌داری سەر، نەخۆشی یان گیرانی لووت؛ anosmic *adj*) ۞ فقدان شامه

**another** /ə'nʌðə(r)/ *adjective*, *pronoun*

یەکێکی تر، یەکێکی دی، دانەیێکی تر، تر، دی، دن، کەسێکی تر، ئەویدی، ئەویتر: *Let's do it another time* ۞ دیگر، دیگری، یکی دیگر

**anovulant** /a'nɒvjʊl(ə)nt/ *adjective*

ئاماژە بەو دەرمان یان هۆکارەی کە ڕێگە لە گەرادانان یا هێلکۆکەدانان دەگرێ ۞ آنوولانت

**anovulatory** /ˌanɒvjʊ'leɪt(ə)ri/ *adjective*

(پزشکی، دەربارەی سووری بێ‌نوێژی menstrual cycle) هێلکۆکەدانان تیا ڕوونادا: *anovulatory bleeding* ۞ آنوویولاتوری

**anoxaemia** *noun*, US anoxemia

(پزشکی) نەبوون یان کەمی ئۆکسیژێن لە خوێنی خوێنبەرا (anoxemic *adj*: تووش‌بوو بە anoxaemia) ۞ آنوکسمیا

**anoxia** /a'nɒksɪə/ *noun*

(پتـر پزشـکی) نـەبوون absence یـان کـەمی deficiency ئۆکسیژێن لە شانە، medium و... (anoxic adj: تووش‌بوو بە ئانۆکسیا) ◌ آنوکسیا

**ans** *abbreviation* answer

**ANS** *abbreviation* autonomic nervous system

**Anschluss** /'anʃlʊs/ *noun*

خستنەسەری نەمسا (یان ئوتریش) بە ئەلمانەوە لە 1938 (بنەڕەت: ئەلمانی، لە *anschliessen* "پێکەوە لکاندن، دانەدەم، "to join") ◌ آنشلوس

**anserine** /'ansərʌɪn/ *adjective*

قازئاسا، شێوەقاز، وەکوو قاز، قازی (لە لاتین، لە *anser* *anserinus* "قاز") ◌ غازمانند

**answer** /'ɑːnsə(r), US 'æn-/ *noun*

1 وەلام، وەرام، بەرسڤ 2 کاردانەوە، دژکردەوە 3 چارەسەری، ڕێگاچارە ◌ 1 پاسخ، جواب 2 واکنش 3 حل مسأله

**answerable** /'ɑːnsərəbl, US 'æn-/ *adjective*

1 بەرپرس، وەلامدەرەوە، شیاوی وەلامدانەوە، 2 پێبەند، دەربەست responsible = 3 (کۆن) suitable ,adequate 4 (کـــــــــــــــــۆن) = similar ,corresponding (answerability *n*) ◌ 1 مسؤل، جواب‌دادنی 2 ملتزم

**answering** *adjective*

لە وەلامدا ◌ در پاسخ

**answering machine** *noun*

پەیامنووس، دەزگای وەلامدانەوە یان بەیامنووسین ◌ پیام‌گیر

**answephone** /'ɑːnsəfəʊn, US 'ænsərfoʊn/ = answering machine

**-ant, -ent** *suffix*

پاشگر: 1 (ناو دروست دەکا) ـکار، ـکەر، ـندە، ـنەر، ـڤان، ـوان، ـانی: *coolant* ,*claimant* 2 (ئاوەلناو دروست دەکا) ئاماژە بە *deodorant* تایبەتمەندی کردەوە یا دۆخێ: *arrogant* ◌ پسوند: 1 ـکننده 2 صفت‌ساز

**ant-** *prefix*

پێشگر: پێچەوانە، دژ، دژە، بەرقازی، پەرچە، ئاوەژوو (کورتەی پێشگری anti، بەرلە بزوێنێ یان *h*) ◌ پیشوند: ضد، پاد، مخالف

**ant** /ænt/ *noun*

1 مێروولە، مێرووژە، مووری، مرۆچە، مژلۆک، مزلۆر، مجلەور، گێرک 2 مێرووەکانی خێزانی Formicidae لە تیرەی Hymenoptera (پەردەبالان، کونەمێرووسوار long-legged ant؛ فریز: have ants in one's pants: کێچ کەوتە کەولەوە، ئۆقرە لێ‌هەلگیران) ◌ مورچە

**anta** *noun*, *pl.* antas or antae

(بیناسازی) کولەکە یا ستوونی تەنیشتی زوورگە، ستوون یان کۆلەکەی چوارپالووی زوورگەیێ، ب.ت. هی دیوارێکی بەردکاری ◌ آنتا

**antacid** /ænt'æsɪd/ *adjective, noun*

*adj* دژەترشەلۆک، دژەترش *n* دەرمانی دژەترشەلۆک (دەرمانێکە کە بەر بە ئەسیدیتی دەگرێ یان راستی دەکاتەوە، ب.ت. لە گەدەدا) ◌ *adj* ضد اسید *n* داروی ضد اسید

**antaean** *adjective*

1 وەک ئانتیۆس (ب.ت. لەباری هێزەوە) 2 خاوەنی هێزی کەلەپیاو یان سوپێرمەن 3 mammoth2 ◌ 1 شبیه آنتیوس 2 دارای قدرت ابرمرد

**Antaeus** *noun*

ئانتیۆس: دێوێ کە هێرکول Hercules بەسەریدا زالبوو ◌ آنتیوس

**antagonism** /æn'tægənɪzəm/ *noun*

دوژمنایەتی، قینگیری، دژایەتی، ناکۆکی، بەربەرەکایەتی، رکەبەرایەتی: *antagonism between factions* ◌ خصومت، تضاد، تعارض، مخالفت

**antagonist** /æn'tægənɪst/ *noun*

1 دوژمن، نەیار، هەڤرک 2 ناکۆک، پێکدژ، بەرهەلست، دژ، دژبەر 3 (توێکاری، هەروەها antagonistic muscle) دژکردار: جووتێ ماسوولکە کە دژی یەکتر دەجوولێنەوە 4 (زیندەکیمیا) ماکێکی کیمیایی نێو لەش بۆ کەمکردنەوەی چالاکی کارئەندامناسی(یانەی) physiological activity ماک یان مادەیێکی کیمیایی تر (وەک opiate) ◌ 1 دشمن، رقیب، حریف 2 مخالف 3 و 4 آنتاگونیست

**antagonistic** /æn,tægə'nɪstɪk/ *adjective*

1 دوژمن، نەتل، دژ، نەیار 2 دوژمنکارانە، دوژمنانە، دژبەرانە ( antagonistically /-kli/ *adv*) ◌ 1 دشمن، مخالف 2 مخالفت‌آمیز

**antalgic** *adjective*

ژانبر، دامرکێن، ژانشکێن، هێدیکەرەوە ◌ مسکن

**antalkali** *noun, pl.* antalkalis or antalkalies

دژەئالکالی، شتێ کە ئالکالییەکان لە کار دەخا یا بەرهەلستی ئالکالینیتی دەکا (یا لە کاریگەری دەخا، antalkaline *adj, n*) ◌ آنتالکالی

**(the) Antarctic** /æn'tɑːktɪk, US -'tɑːrk-/ *noun*

باشووران، جەمسەری باشووری، ناوچەکانی جەمسەری باشووری ◌ جنوبگان، نواحی قطب جنوب

**Antarctica** *noun*, also Antarctic Continent

وشکاری باشووران: وشکاری دەوروپشتی جەمسەری باشووری، زۆرینەی تەختەسەهۆلێ دایپۆشیوە (دەوروبەری 12,950,000 کیلۆمیتری چوارگۆشە (5,000,000 مایلی چوارگۆشە) ◌ قارەی جنوبگان

**Antarctic Circle** *noun*, also antarctic circle
خولگــەی جەمــسەری باشــووری، ســوورگەی باشووران ۞ مدار جنوبگان

**Antarctic Ocean** *noun*, also Southern Ocean
ئۆقیانووسی باشووران یان جەمسەری باشووری، ئۆقیانووسی سەهۆلبەندی نیوەرۆیی ۞ اقیـانوس جنوبگان

**Antares** *noun*, Greek *Antarēs*
(ئەستێرەوانی) ئەنتاریس، بارام‌ناسا ۞ قلب‌العقرب

**ant bear** *noun*, also aardvark

**antbird** *noun*
مێرووگرە، باڵندەیێکی مێرووخۆری لاق‌درێژی کلکـکورت، زۆرتر لە دارستانەکانی ناوچـە گەرمەکانی ئەمریکای باشووری‌دا دەبینرێ [خێزان Formicariidae: زۆر جۆرن] ۞ نوعی پرنده

**ant cow** *noun*
مێشوولە یان شۆکەی گیایی ۞ شبشه

**ante-** /'ænti/ *prefix*
پێشگر: بەر، پێش، لە پێش(ەوە): *antecedent*، *antedate*، *antediluvian* (ج کات، ج شوێن؛ بنەڕەت: لە *ante* لاتینەوە "before") ۞ پیشوند: پیش، قبل

**ante**[1] /'ænti/ *noun*
1 بایی، نرخ، بوها، دانگ، خەرج 2 بڕی دانراو، داو (قومار، ب.ت. پەڕین poker) ۞ 1 قیمت، دانگ، هزینه 2 مبلغ وسط‌گذاشته‌شده

**ante**[2] /'ænti/ *noun*, up *or* raise the ante
زۆرکردنی ئاستی شتێ ب.ت. داخوازی یا پارە، زۆرتر ویستن ۞ بر خواسته‌های خود افزودن

**anteater** /'ænti:tə(r)/ *noun*
گیانەوەری مێروو(لە)خۆر، مێرووڵەخۆرە، بە لمۆزێکی درێژ و زمانێکی چەسپاوی‌یەوە [زۆر جۆرن، پتر لە خێزانی Myrmecophagidae (ئەمریکای ناوەندی و باشووری)] ۞ جانور مورچه‌خوار

**antebellum** /,ænti'beləm/ *noun*
پێش‌شەڕ، بەر لە جەنگ (ب.ت. شەڕی نێوخۆیی ئەمریکا؛ بنەڕەت: لە لاتینەوە: *ante* "before" و *bellum* "war") ۞ پیش از جنگ

**antecedence** /,æntı'si:dns/ *noun*
پێشکەوتن، چوونەپێش، بەرکەوتن، پێشەکێتی، لەپێشەوەبوون، پێشترایەتی ۞ تقدم، سبقت، اولویت

**antecedent** /,æntı'si:dnt/ *adjective*
1 پێش‌تر، پێشکەوتوو، پێش‌وەچوو، پێشوو، بەری، پێشی، پێشین 2 پێشەکی 3 (ڕێزمان) پێش‌ترە، مەرجەع ۞ 1 قبلی، مقدم، پیشین 2 مقدمه 3 مرجع

**antecedents** *noun, pl.*
باوپیران، پێشینیان، رابردووان، پێش‌زیاوان ۞ اجداد، نیاکان

**antecessor** /,æntı'sesə(r)/ *noun*
پێشڕەو، پێشەنگ ۞ پیشرو

**antechamber** /'æntitʃeımbə(r)/ = anteroom

**antediluvian** /,æntidı'lu:viən/ *adjective, noun*
*adj* 1 سەربە پێش لافاوی پێغەمبەر نـووح (Noah's Flood) 2 کـۆن، بەدەرلـەمێژوو، سەرەتایی، لەباوکەوتوو *n* مرۆی کۆنەپەرست ۞ *adj* 1 آنتی‌دیلووین 2 بدوی، قدیمی، مال عهد دقیانوس *n* آدم مرتجع

**antefix** *noun, pl.* antefixae or antefixes
(بیناسـازی) ئـەنتیفـیکس، رووگوێـوانە ۞ روقرنیزی

**anteflexion** *noun*
ئەنتی‌فلێکسیۆن، پێشەچەمان (چەمانەوە بەرەو پێشەوە، لە منداڵدان‌دا) ۞ آنتی‌فلکسیون

**antelope** /'æntıləʊp, US -loʊp/ *noun, pl.* same or antelopes
ئاسـک، ئاسـکەکێوی، بزنـەکێوی (ب.ت. لـە ئـەفریکا، gazelle، impala، gnu و eland ـەکان دادەگرێ) ۞ بز کوهی، آهو

**antemeridian** *adjective*
سەربە پێش‌نیوەڕۆ یان بەیانی ۞ وابسته بـه قبـل از ظهر

**ante meridiem** *adjective, abbreviation* a. m.
پێش‌نیوەڕۆ، بەیانی (لە نێوەشەوەوە تا نیوەڕۆ) ۞ قبل از ظهر

**antemetic** /ænt'ı, US etık/ *adjective, noun*
*adj* دژی ڕشانەوە، نەهێڵەرشانەوە *n* دەرمانی دژی ڕشانەوە ۞ *adj* ضد قی *n* داروی ضد قی

**ante mortem** /,æntı'mɔ:təm/ *adjective*
(لاتین) بەرلە مردن، بەرلەمەرگ، پێش‌مردن ۞ قبل از مرگ

**antenatal** /,ænti'neıtl/ *adjective, noun*
*adj* 1 کۆرپەلـەیی، ئاوەلـمەیی، پێش لـە دایک‌بوون، پێش‌بوون 2 سەربە ژنانی سکپڕ *n* تێڕوانینی قۆناخی سکپڕی، تێڕوانینی پزشکی لەسەر ژنانی سکپڕ، تێڕوانینی پزشکی سەردەمی سکپڕی ۞ *adj* 1 پیش از تولد، جنینی 2 وابسته به زنان باردار *n* معاینه‌ی زنان باردار

**antenna** /æn'tenə/ *noun, pl.* antennae /-ni:/
1 هەستەوەر، شاخ، شاخۆچکە، شاخەهەست 2 ئـانتێن، شـاخە، شـەپۆلگر، هـەوایی، aerial (*adj* antennal؛ *adj* antennary؛ بنەڕەت: لە لاتین، گۆڕاوی *antemna* "yard" (ی کەشتی‌ی)"، لـە کـۆدا بـۆ وەرگێـڕانی *keraioi* یۆنـانی بەکاردێتێ "شاخەکان (ی مێروویی)") ۞ 1 شاخک 2 آنتن

**antennule** /an'tɛnjuːl/ *noun*
(گیانەوەرناسی) شاخی چکولـە، شـاخوچکە، شاخچە ◌ شاخک

**antenupital** = (chiefly Brit.) another term for prenupital

**antepenult** /ˌæntɪ'pɪnʌlt/ *noun*
کەرتە یان بڕگەی سێیەم بەرلە دوایی ◌ هجا سوم قبل از آخر

**antepenultimate** /ˌæntipen'ʌltɪmət/ *adjective*
سێیەمین لە ئاخرەوە ◌ سومی از آخر

**anterior** /æn'tɪəriə(r), US -'tɪr-/ *adjective*
پێشوو، پێشین، پێشتر، لەپێش، پێشەوە، بەرکەوتوو (دژی posterior؛ anteriorly *adv*) ◌ قبلی، جلوی، قدامی، مقدم

**anterior cruciate ligament** *noun, abbreviation* ACL
بەندی خاچی پێشەوە یان پێشین، ئەی‌سی‌ئێل ◌ ای‌سی‌ال

**anteriority** /æn͵tɪrɪɔːrɪtɪ, US -'ɒr-/ *noun*
پێشترایەتی، لەپێشەوەبوون، لە بەرەوەبوون، لەپێش‌بوون، لەپێشایەتی، لەپێشتربوون، پێشینی ◌ تقدم

**ante-room** /'æntiruːm, US -rʊm/ *noun*
پێشخان، کەوش‌کەن، ژووری چاوەڕوانی، پێش‌دیو ◌ پیش‌تالار

**anthelmintic** /ˌanθ(ə)l'mɪntɪk/ *adjective, noun*
(پزشکی، دەرمانی) کرم‌کوژ، کرم‌فەوتێن، ب.ت. هی ریخۆڵە ◌ کرم‌کش

**anthem** /'ænθəm/ *noun*
سرود؛ سرودی نیشتمانی national anthem (anthemic *adj*: سرودی، سەربە یان پێوەندی بە سرودەوە هەیە) ◌ سرود؛ سرود ملی

**anthemion** /an'θiːmɪən/ *noun, pl.* anthemia /-mɪə/
گوڵک: جۆرێ نەخشی جوانی بە شێوەی هێشووەگەڵای باریکی پەڕەکانی honeysuckle ◌ آنتیمون

**anther** /'ænθə(r)/ *noun*
پۆرگ، هەڵاڵەدان (بەشێ لە گوڵ، لەسەرووی نێرەندامی گوڵ کە هەڵاڵە pollen تیایە یا بەرهەم دێنێ، antheral *adj*: پۆرگی، سەربە یان پێوەندی بە پۆرگەوە هەیە؛ بنەڕەت: لە *anthēra* یۆنانی "flowery") ◌ بساک

**anther culture** *noun*
چاندنی پۆرگ، پۆرگ‌چێنی، کردنی پۆرگ ◌ کشت بساک

**antheridium** /ˌanθə'rɪdɪəm/ *noun, pl.* antheridia /-dɪə/
پۆرگە، ئەندامی نێرینەی بێ‌گوڵەکان، نێرەکی بێ‌گوڵەکان (antheridial *adj*: پۆرگەیی، سەربە نێرەکی بێ‌گوڵەکان، ئەنسێریدیاڵ) ◌ انتریدیوم

**antherozoid** /ˌanθ(ə)rə(ʊ)'zəʊɪd/ = spermatozoid (Botany)

**anthesis** /an'θiːsɪs/ *noun*
پرۆسەی کرانەوە یان درانی پۆرگەکان کە لەو ماوەیەدا هەڵاڵە بڵاو دەبێتەوە، پۆرگەدڕێ، پۆرگ‌دران، پۆرگ‌کرانەوە ◌ انتیز، انتیسیس

**anthill** /'ænthɪl/ *noun*
کۆما خۆڵی مێرووله، تەپەمێرووله ◌ تپەی مورچە

**antho-** /'anθəʊ/ *prefix*
پێشگر: 1 گوڵ 2 سەربە گوڵەکان، وەک anthophilous (لە anthos یۆنانییەوە "flower") ◌ پیشوند: 1 گل 2 وابستە بە گل‌ها

**anthocyanin** /ˌanθə(ʊ)'sʌɪənɪn/ *noun*
(کیمیا) ئانتۆسیانین: ڕەنگێکی flavonoid ی سوور، شین یان بەنەوش، کە لە گیاکاندا بینراوەتەوە ◌ آنتوسیانین

**anthologist** *noun*
کۆکەرەوەی هەڵبژاردەکان ◌ گردآورندەی منتخبات

**anthology** /æn'θqlədʒi, US -'θɑːl-/ *noun, pl.* anthologies
هەڵبژاردە، کەشکۆل، گوڵبژێر ( anthological *adj*) ◌ منتخبات، جُنگ

**anthophilous** /an'θɒfɪləs/ *adjective*
(گیانەوەرناسی، مێرووەکان یان گیانەوەران) گوڵ‌خواز، گوڵ‌دۆست: *anthophilous insects* ◌ گل‌دوست

**anthophore** *noun*
گوڵ‌هەڵگر، گوڵ‌دار، ئانتۆفۆر: درێژبوونەوەی بنکی گوڵ کە لە سەرەوەی ئەندامانی زاوزێ هەڵکەوتووە و لە بنەوەی ئەندامانی داپۆشینی گوڵ لێ دەبێتەوە ◌ آنتوفور

**anthophylite** *noun*
ئانتۆفیلیت: جۆرێ کانی orthorhombic کۆمەڵی ئامفیبۆل amphibole کە لە بنەڕەتا سیلیکاتی مەنیزیۆم و ئاسنە ◌ آنتوفیلیت

**anthotaxy** *noun*
ڕێکخستن یان دانانی گوڵەکان لە هێشوویەکی گوڵ‌داردا ◌ انتوتاکسی

**Anthozoa** /ˌanθə'zəʊə/ *noun, pl.*
(گیانەوەرناسی) گوڵاژەڵان: پۆلێکی بەربڵاوی coelenterate دەریاییەکان کە sea anemone ەکان و شیلانەکان coral دەگرێتەوە (anthozoan *n, adj*: (گیانەوەری) گوڵاژەڵ؛ بنەڕەت: لە یۆنانییەوە، *anthos* "گوڵ" + *zōia* "ئاژەڵان") ◌ انتوزوآ

**anthracene** /'anθrəsiːn/ *noun*
جۆرێ هایدرۆکاربۆنی سێ‌بازنەیی tricyclic کریستاڵی $C_{14}H_{10}$ کە لە دڵۆپاندنی distillation

قەتران coal tar دەگیرێ ◇ آنتراسن

**anthracite** /'ænθrəsaɪt/ *noun*

ئەنسریـــــسایت، ئەنتراســـــیت، ئانتراســــایت، خەڵووزک (= جۆرێکی خەڵووزی زۆر ڕەق کە بــە دووکــەڵ یــا گــڕێکی کەمــەوە دەســووتێ؛ (anthracitic *adj* ◇ آنتراسیت

**anthracnose** /an'θraknəʊʃ/ *noun*

خەڵووزە، خەڵوزوو (لەسەر پێوانەی کوێروو)، نەخۆشییێکی کەرووپی ڕووەک، دەبێتە هۆی برینێکی ڕەش ◇ آنتراکنوس

**anthranilic acid** /ˌanθrə'nɪlɪk/ *noun*

(کیمیـــا) ترشەڵـــۆکی خەڵـــووزانیلیک یــــان ئانترانیلیک: ترشەڵۆک یا ئاوێتەیێکی کریستاڵی زەرد یــــان بــــێ‌ڕەنــــگ $NH_2C_6H_4COOH$ (anthranilate *n*) ◇ اسید آنترانیلیک

**anthraquinone** /ˌanθrə'kwɪnəʊn/ *noun*

ئاوێتەیێکی بلووری زەرد، بنەڕەتی زۆر ڕەنگ $C_{14}H_8O_2$ ◇ آنتراکوینون

**anthrax** /'ænθræks/ *noun, pl.* anthraces

تـــیراوێ، هەوەپیـــسە، شـــێرپەنجە، ڕەشـــەبرین، کەوگیرە 1 نەخۆشییێکی گیرۆی infectious (وردە)پاتاڵ و ڕەشـەوڵاخ و گیانەوەرانی تر کە بەهۆی بەکتریای (*Bacillus anthracis*) تووش دەبێ، بە ڕێگای خوری و بەروبووی ئاژەڵی تر بۆ مرۆڤ رادەگوێزرێ 2 ئەو زیپکە ڕەشانەی کە لەسەر پێستی مرۆڤ هەڵدەزلەپێ (هەر بەم بەکتریایە؛ بنەڕەت: لە لاتینەوە، لە *anthrax*، - *anthrak*- یۆنانییەوە "carbuncle ،coal") ◇ سیاه‌زخم

**anthrop(o)-** /'ænθrəpəʊ, US -poʊ/ *prefix*

پێشگر: 1 مرۆ(ڤ)ــ خەڵـکــ 2 سەربە مرۆڤ (بنـەڕەت: لـە *anthrōpos* یۆنـانی " human being") ◇ پیشوند: 1 انسانـ مردمـ 2 وابسته به انسان

**anthrop.** = 1 anthropological 2 anthropology

**anthropic** /an'θrɒpɪk/ *adjective,* also anthropical

سەربە یان پێوەندی بە مرۆڤەوە یان سەردەمی پەیدابوونی لەسەر زەوی (لە *anthrōpikos* یۆنانی، لە *anthrōpos* "مرۆڤ") ◇ آنتروپیک

**anthropic principle** *noun*

بنەما یان پرەنسیپی مرۆڤی: هەر دوو بنەما یان پرەنسیپەکەی بواری گەردوونناسی: ئەو پرەنسیپە گەردوونناسانە کە تیۆرییەکانی جیهان بەهۆی پێویستییەکان necessity (یان پێداویستی) سنووردار دەکرێتەوە تا ڕێگا بە بوونی مرۆڤ بدەن 1 بنەما یان پرەنسیپی مرۆڤیی لاواز (هەروەها weak anthropic principle) 2 بنەما یان پرەنسیپی مرۆڤیی بەهێز (هەروەها strong anthropic principle) ◇ اصل انسانی

**anthropocentric** /ˌænθrəpə'sentrɪk/ *adjective*

مــرۆڤمــەدار، مــرۆڤناوەنــد، مــرۆڤتــەوەر (anthropocentricity *n*: مــرۆڤمــەداری، مــــرۆڤناوەنــــدی، مــــرۆڤتــــەوەری؛ anthropocentrically *adv*: مـرۆڤمەدارانـە، مرۆڤناوەندانە، مرۆڤتەوەرانە) ◇ انسان‌مدار

**anthropocentrism** /ˌænθrəpə'sentrɪzəm/ *noun*

مرۆڤمەداری، مرۆڤناوەندی، مرۆڤتەوەری (anthropocentrist /ˌænθrəpə'sentrɪst/ *n*) ◇ انسان‌مداری

**anthropogenesis** *noun*

مرۆگۆڕانناسی، زانستی مرۆڤ و گۆڕانی ◇ آنتروپوژنیز، آنتروپوژنسیس

**anthropogenic** /ˌanθrəpə(ʊ)'dʒɛnɪk/ *adjective*

(زۆرتر لەبارەی پیسی (ژینگە) مرۆڤپێکهێن، مرۆڤساز، لە ئەنجامی چالاکییەکانی مرۆڤ (anthropogenically *adv*) ◇ آنتروپوژنیک

**anthropography** *noun*

ئەنسروپۆگرافی، مرۆڤۆگرافی ◇ آنتروپوگرافی

**anthropoid** /'ænθrəpɔɪd/ *adjective, noun*

*adj* مرۆڤئاسا، سامرۆ، شێوەمرۆ *n* مەیموونی مرۆڤئاسا یان شێوەمرۆ (anthropoidal *adj*) ◇ *adj* انسان‌نما *n* میمون انسان‌نما

**anthrolatry** *noun*

مرۆ(ڤ)پەرستی ◇ انسان‌پرستی

**anthropology** /ˌænθrə'pɒlədʒi, US -'pɑːl-/ *noun*

مـرۆڤناسـی (anthropological *adj*: سـەربـە مرۆڤناسی؛ anthropologist *n*: مرۆڤنـاس) ◇ مردم‌شناسی، انسان‌شناسی

**anthropometry** /ˌanθrə'pɒmɪtri/ *noun,* also anthropometrics

مـرۆڤپێـوی، لـەشپێـوی (پێـوانی تایبەتمەنـدی لەشـی مـرۆڤ؛ anthropometric *adj*: سـەربە مرۆڤپێوی، لەشپێوییانە) ◇ انسان‌سنجی

**anthropomorphic** /ˌænθrəpə'mɔːfɪk, US -'mɔːrf-/ *adjective*

مرۆڤـێنەر، بـەمرۆڤدانانـەر، بـەمرۆزان: *an explanation of animal behaviour in anthropomorphic terms* - anthropomorphically /-kli, US -'mɔːrf-/ *adv*: مرۆڤـێنەرانە، بەمرۆڤدانانەرانە) ◇ انسان‌انگار

**anthropomorphism** /ˌænθrəpə'mɔːfɪzəm, US -'mɔːrf-/ *noun*

مرۆڤـاندن، بـەمرۆڤدانـان، بـەمرۆزانی، ڕێـبازی لێکچوانـــــــــــــدن، humanization (anthropomorphist *n*) ◇ انسان‌انگاری

**anthropomorphization** *noun*
دانـانی تایبـەتمـەنـدی مرۆڤـی بـۆ خـودا ۞ ئانترۆپۆمۆفیزاسیون

**anthropomorphosis** *noun*
گۆران بەرەو شێوەی مرۆڤ، شێوەمرۆڤ گری ۞ ئانترۆپۆمورفوز

**anthropomorphous** *adjective*
مرۆڤ لە شێوە یا سروشتدا ۞ ئانترۆپۆمورفوس

**anthropopathy** /ˌanθrəˈpɒpəθi/ *noun*
دانەپاڵی هەست و سۆزی مرۆڤ سەبارەت بە خودا ۞ ئانترۆپۆپاتی

**anthropophagi** /ˌanθrəˈpɒfəgʌɪ/ *noun, pl.*
(لە ئەفسانەکاندا) مرۆخۆر، پیاوخۆر ۞ آدم‌خوار

**anthropophagy** /ˌanθrəˈpɒfədʒi/ *noun*
مرۆخۆری، پیاوخۆری (-/ anthropophagous gəs/ *adj*: مرۆخۆر، بنیادەمخۆر، پیاوخۆر؛ anthropophagus *adj*) ۞ آدم‌خواری

**anthurium** /anˈθ(j)ʊərɪəm/ *noun, pl.* anthuriums
گوڵەکلکە؟، گیایێکی گەرمێنانی ئەمریکا [تۆخم *Anthurium*] (بنـەڕەت: لـە *anthos* یونـانی "گوڵ" + *oura* "کلک") ۞ ئانتوریوم

**anti-**/ˈænti/ (also ant-) *prefix*
پێشگر: 1 دژـ دژی، بەرامبەر، نەهێڵە-: *anti-* 2 (فیزیـــــک) *antimissile* ،*aircraft* دژەپارچۆلکەی پارچۆلکەیێکی تایبەتی (بنـەڕەت: لـە *anti* یونـانیـەوە "against") ۞ پێشوند: 1 ضد-، پاد 2 (فیزیک) آنتی

**anti** *preposition, noun*
1 دژ بـە، دژی 2 (نافـەرمی) دژی شـتێ ۞ 1 علیه، ضد 2 مخالف چیزی

**antiabortion** *noun*
دژەلەباربردن، دژەهەڵکەندن: دژی لەباربردن یان قـانونی کـردنی لـەبـاربردن: *antiabortion lobbyists*؛ antiabortionist *n*): دژی لەباربردن، دژەلەباربەر، دژەبارکوژ) ۞ آنتی‌آبورسیون

**antiadrenergic** *adjective, noun*
*adj* دژەئارینالینڕژێن: سەربە یان پێوەندی بەو ماکـەوە هـەیـە کـە دژی کاریگـەری کارئەندامناسـیەکـانی ئێپینێفرینـە *n* ماکێکی دژەئادرینالیندەردەر یان دژەئارینالینڕژێن ۞ آنتی‌ادرنیرژیک

**anti-aircraft** *adjective, noun*
دژەفڕۆکـە، فڕۆکەشـکێن، تـۆپخانـەی دژی فڕۆکەکانی دوژمن، وادرێژراوە یان پێوەندی هەیە بە گێڕانەوە یان (بۆ) بەرگری دژی هێرشـی ئاسمانی ۞ ضدهوایی، پدافند

**anti-American** *adjective, noun*
*adj* دژەئەمریکایی: دژ یان دوژمنی ئەمریکا، گـەل، بنـەمـا و سیاسـەتـەکـانی *n* کـەسێکی دژەئەمریکایی ۞ ضد امریکایی، پادامریکایی

**anti-Americanism** *noun*
دژەئەمریکا(یی)گەری ۞ پادامریکاگرایی

**antianxiety** *noun*
دژەنگەرانی، دژی دڵەڕاوکێ، دژی دڵەکوتە ۞ ضد نگرانی

**antibacterial** *adjective*
دژەبەکتری، چالاک بەدژی بەکتریا، دەفەوتێنێ یان بەری هەڵدان و گەشەی بەکتریاکان دەگرێ ۞ ضدباکتری

**antiballistic missile** *noun*
مووشەکێ دژەبالیستیکی، مووشەکێ بۆ فەوتاندن و لێدانی مووشەکە بالیستیکییەکان ۞ موشک ضدبالیستیکی

**antibiosis** /ˌantɪbʌɪˈəʊsɪs/ *noun*
(زیندەناسـی) دژەهـاوژینی: دژایـەتی نێـوان میکرۆبێک و بەرهەمی میکرۆبێکی تر کە دەبێتە هۆی تیاچوونی میکرۆبی سەرەتا، بەشداری یان کۆبوونەوەی دوژمنانە، بە شێوەیێ کە زیندەوەر یان ئۆرگانیزمێ کاریگەرییێکی بەزیانی لەسەر هەڵدان یان پەرەسەندنی سروشتی ئەویدی هەیە (بنـــەڕەت: لـــە -symbiosis + anti) ۞ آنتی‌بیوسیس، پادزیستی

**antibiotic** /ˌæntibaɪˈɒtɪk, US -ˈɑːtɪk/ *adjective, noun*
دژەزینـدە، ئـانتیبیوتیـک، زینـدەدژ، دژەبـەکتریا (ب.ت. پێنی‌سیلین)، دەرمانێ کە بەرلە هەڵدان و پەرەسەندن دەگرێ و یان وردەزیندەوەرەکان تیادەبا ۞ پادزیست

**antibody** /ˈæntibɒdi, US -bɑːdi/ *noun, pl.* antibodies
1 نەهێڵەلەش، ئـەنتیبـادی، دژەتـەن، دژتـەن 2 ئانتیبادییەکانی جۆرێکی تایبەتی (بە گشتی)، هەروەها immunoglobulin ۞ پادتن

**antibody-mediated immunity** *noun*
پارێزراوی کەسێ بە ڕێگای چالاکی خانەکانی Bشـــێوە (وە) و گـــەڕان یـــان ســـووڕانی ئـانتیبـادییـەکـان (بڕوانـە cell-mediated immunity) ۞ آنتی‌بادی میدیاتد ایمیونیتی

**antic** *noun, adjective,* also antics
*n* 1 ڕەفتار یان هەڵس‌وکەوتی سەیر 2 شانۆی گاڵتەجاڕ 3 پێرفۆرمێر یان نوێنەری گرۆتێسک یان بـەشێکی گاڵتـەجاڕانـە *adj* 1 پێکـەنینی، گاڵتەجاڕ 2 سەیر(وسەمەرە، لە پەیکەرتاشیدا، وەک gargoyle) 3 (کـــــــــۆن) grotesque، frolicsome = 4 bizarre (antically *adv*) ۞ *n* 1 رفتار عجیب 2 نمایش مضحک 3 آنتیک *adj* 1 مضحک 2 عجیب و غریب

**anticancer** *adjective*
دژەشێرپەنجە: بۆ پێش‌گیری یان چارەسەری شێرپەنجە بەکاردێتێ یا کاریگەرە ۞ آنتی‌کانسر

**anticatalyst** *noun*

خاوکەرە، ناهاندەرە، ناتاوەدەرە، دواخەرە، ئەنتی‌کاتالیست (ماکێ کە کارلێکی کیمیایی دوادەخا یان خاودەکاتەوە) ۞ آنتی‌کاتالیست

**antichoice** *adjective*
دژی ئەو بیرۆکەیە کە ژنێکی سکپڕ مافی سەرپشکبوونی لەباربردنی هەیە، هەروەها antiabortion ۞ آنتی‌چویس

**anticholinergic** /ˌæntɪˌkəʊlɪˈnɜːdʒɪk/ *adjective, noun*
دژەکۆلینێرژیک: *adj* ڕێ لە کاری neurotransmitter ـەکان دەگرێ، سەربە یان پێوەندی بەو ماکەوە هەیە کە دژی کاریگەری‌یەکانی acetylcholine ـە *n* دەرمان یا ماکێکی ئانتیکۆلینرژیک ۞ آنتی‌کولینرژیک

**anticholinesterase** *noun*
دژەکۆلینێستراز: هەوێنە یان دەرمانی (وەک neostigmine) کە بەرلە کاری acetylcholinesterase دەگرێ ۞ آنتی‌کولینستراز

**antichrist** /ˈæntikraɪst/ *noun*
دوژمنی مەسیح، دەجال، دژەمەسیح، مەسیحی درۆ ۞ دشمن مسیح

**anticipant** *adjective, noun*
*adj* 1 دووگیان، سکپڕ، چاوەڕێی منال 2 چاوەڕوان، چاولەڕێ، چاوەدوا، تەماوەر 3 پێش‌بینی‌کەر *n* کەسێکی پێش‌بینی‌کەر ۞ *adj* 1 حامله، آبستن 2 منتظر 2 پیش‌بینی‌کننده *n* آدم پیش‌بینی‌کننده

**anticipation** /ænˌtɪsɪˈpeɪʃn/ *noun*
1 چاوەڕوانی، تەماوەری 2 پێش‌بینی، مەزندە 3 دەس‌پێش‌کەری، دەست‌پێش‌خەری، دەست‌پێش‌خستن 4 بەرگیری، پێش‌گیری، پێش‌گرتن (anticipative *adj*: چاوەڕوان؛ anticipator *n*) ۞ 1 انتظار 2 پیش‌بینی 3 پیش‌دستی 4 جلوگیری

**anticipatory** /ænˌtɪsɪˈpeɪtəri, US ænˈtɪsəpətɔːri/ *adjective*
1 پێش‌بینانە، بەرگیرانە، پێش‌گیرانە، بە پێش‌گرتنەوە: *took anticipatory measures to prevent floods* 2 لەوەپێش 3 چاوەڕوان، لە چاوەڕوانی‌دا ۞ 1 پیش‌بینانه، پیش‌گیرانه 2 از قبل 3 منتظر

**anticlerical** *adjective*
(زۆرتر مێژوویی) دژەئایین‌گەر (بۆ دەست‌تێوەردان لە کاروباری گشتی)، دژەئایین‌گەرانە، دژی دەسەڵاتی پیاوانی دینی یان کلیسە یان کاروباری گشتی یان دنیایی secular (anticlericalism *n*: دژەئایین‌گەری، دژەئایین‌گەریتی (دژی دەست‌تێوەردانی ئایین لە کاروباری رامیاری‌دا؛ anticlericalist *n*)) ۞ روحانیت‌ستیز

**anticlimax** /ˌæntiˈklaɪmæks/ *noun*
1 داکەوتن، داشکان، شۆڕبوونەوە، داچوون، هاتنەخواری، لێژبوونەوە 2 ڕووداو، قۆناخ یان ئەنجامێ کە بە شێوەیێکی بەرچاو لە گرنگایەتی چاوەڕوانکراوی کەمتر دەبێتەوە، کەوتنان، داکەوتن، داشکان (وەک لە داستان و چیرۆکەکان‌دا، وەک "ژنەکەم مرد، ماڵەکەمیان برد و سەگەکەشم گوم بوو") 3 ناهومێدی، دڵساردی (anticlimactic(al) /ˌæntiklaɪˈmæktɪk/ *adj*: بەرەوخوار، لێژەوەبوو، ڕوولەخوار، ڕوولەداشکان؛ anticlimactically /ˌæntiklaɪˈmæktɪkli/ *adv*) ۞ 1 نزول، افت، سقوط 2 آنتی‌کلایمکس، افتگاه، فرود 3 یأس

**anticlinal** *adjective*
1 تاقسایی، سەربە چینی تاقی، قۆقزی‌یانە 2 خاوەنی کۆمەڵە خانەیێکی گۆشەڕاست لە سەرێ: *an anticlinal pattern of cell walls* 3 خاوەنی بڕبڕەی ڕاست و ئەستوونی ۞ 1 تاقدیسی 2 و 3 آنتی‌کلینال

**anticline** /ˈæntiklaɪn/ *noun*
(زەوی‌ناسی) تاقسا، ساتاق، چینی تاقی یان قۆقز، قۆقزی (لەگەڵ syncline بەراوردی کرێ) ۞ تاقدیس

**anticlinorium** *noun*
تاقساێکی گەورە کە لە چینە بەردینەکان، کە لاتەنیشتەکانی (ئەو)، لە کۆمەڵێ تاقسا و ساچاڵ پێکهاتووە، ساتاقی چین‌چین؟ ۞ تاقدیس شکنجی

**anticlockwise** /ˌæntiˈklɒkwaɪz, US -ˈklɑːk-/ *adverb*
پێچەوانەی سووڕانی میلەکانی سەعات: *Turn the key anticlockwise/in an anticlockwise direction* ۞ خلاف جهت عقربه‌های ساعت

**anticoagulant** /ˌæntikəʊˈæɡjələnt, US -koʊ-/ *noun, adjective*, also anticoagulative
(مەتریاڵی) دژەمەیین، دەرمان یا مەتریاڵی خوێن‌بەستێن یا خوێن‌بەند (وەک هێپارین)، ڕێ لە مەیین (ب.ت. خوێن) دەگرێ ۞ (ماده‌ی) ضد انعقاد

**anticodon** /ˌæntɪˈkəʊdɒn/ *noun*
(زیندەکیمیا) دژەکۆدۆن، دژەسیانە: بەدوای‌یەکهاتنی سێ nucleotide کە یەکەیێکی کۆدی بۆماوەیی یان ژێنێتیکی لە ڕاگوێستنی گەردیکی RNA دا پێکدێنن (بڕوانە codon) ۞ آنتی‌کودون

**anticonstitutional** *adjective*
دژەدەستوور، دژی قانوونی بنچینەیی ۞ مخالف مشروطیت

**anticonvulsant** *adjective, noun*
(دەرمانی) دژەفێ، دژەگەشکە (بۆ بەرگیری یان کەمکردنەوەی ڕادەی توندی epileptic fit یان convulsion) ۞ آنتی‌کونوولسانت

**anticorrosive** *adjective, noun*
دژەژەنگ، ژەنگ‌نەهێن ۞ ضد زنگ

**antics** /'æntɪks/ *noun, pl.*
ڕەفتار یان هەڵس‌وکەوتی سەیر ۞ رفتار عجیب

**anticyclone** /ˌænti'saɪkləʊn, US -'kloʊn/ *noun*
ئەنتی‌سایکلۆن، سووڕدانەوە (anticyclonic *adj*) ۞ واچرخه

**antidepressant** /ˌæntidɪ'presnt/ *adjective, noun*
(دەرمانی) دژەدڵتەنگی یان دژی خەمۆکی، دڵتەنگی‌ڕەوێن ۞ (داروی) ضد افسردگی

**antidiarrhoeal** *adjective*
دژەزگەشۆرە، بەکاردێتریّ بۆ داشکاندن یان ڕەواندنی زگ‌چوون، زگەشۆرەڕەوێن ۞ ضد اسهال

**antiderivative** = indefinite integral

**antidiuretic** *adjective, noun*
*adj* میزبەند: سەربە یان پێوەندی بە ماکێکەوە هەیە کە پێکهاتنی میز دادەمرکێنێ (یان دەوەستێنێ) *n* ماکێکی میزبەند ۞ آنتی‌دیورتیک

**antidiuretic hormone** = vasopressin (*abbreviation* ADH)

**antidote** /'æntidəʊt, US -doʊt/ *noun*
1 ژاربەر، دژەژار، ژارڕەوێن، دژی ژار، ژارکوژ، دەرمان، دەرمانەژار، نۆژداروو: *There is no known antidote to the poison* 2 خەم‌ڕەوێن، شتێ کە کاریگەری ناخۆشی کەم دەکاتەوە: *A Mediterranean cruise was the perfect antidote to a long cold winter* (antidotal *adj*؛ antidotally *adj*) ۞ 1 پادزهر، علاج، ترياق، درمان 2 آنتی‌دوت

**antidromic** /ˌæntɪ'drɒmɪk/ *adjective*
(کارئەندامناسی) دژڕەو: هاندەرەکانی دەمار بۆ لای دژی ڕەوتی ئاسایی دەبا (لە بەرامبەری orthodromic دا؛ antidromically *adv*: دژڕەوانە، بە شێوەکی دژڕەو(انە)) ۞ آنتی‌درومیک

**anti-emetic** *adjective, noun*
(دەرمانی) دژەرشانەوە ۞ (داروی) ضد استفراغ

**antienzyme** *noun*
دژەهەوێنە: ماکێ کە لە لایەن خانەوە دەردەدرێ و کاری هەوێنە پووچەڵ دەکاتەوە ۞ ضدآنزیم

**antiestablishment** *adjective*
دژی یا کاردەکا بە دژی پێکهاتەی دەسەڵاتی ئێستا (antiestablishmentarian *n, adj*: کەسێ کە دژە یان کاردەکا بە دژی پێکهاتەی دەسەڵاتی ئێستا) ۞ آنتی‌استابلیشمنت

**antifebrile** *noun, adjective*
*n* دەرمانی تا *adj* تاشکێن، تاڕەوێن، تابەڕێن ۞ *n* داروی تب *adj* تب‌بر

**Antifederalist** *noun*
1 ئەندامی کۆمەڵێکی رامیاری بەرلە 1789 کە دژی بنەڕەتی حکومەتی ئەمریکا بوون 2 بەرهەڵستکار یان ڕکەبەری فیدرالیزم (Antifederalism *n*: ئانتی‌فیدرالیزم) ۞ آنتی‌فدرالیست

**antiferment** *noun*
دژەترشان ۞ ضد تخمیر

**antifermentative** *adjective*
دژەترشێنەر، لەترشان‌نەهاتوو ۞ ضد تخمیرکننده

**antiferromagnetic** *adjective*
ferrimagnetic = ferrimagnet *n*؛ ferrimagnetism *n*؛ ferrimagnetically *adv*) ۞ آنتی‌فرومانگتیک

**antifertility** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە ماکێکەوە هەیە کە بەری توانایی بۆ بەرهەم‌هێنانی وەچە دەگرێ، ماک یان شتی بەرگیری ۞ وسیلەی جلوگیری

**antifluroridationist** *noun*
کەسێکی دژبە fluoridationی ئاوە گشتییەکان ۞ آنتی‌فلوریداسیونیست

**antifouling** *adjective*
پیسی‌ڕەوێن، پیسی‌بەڕێن: ماکێ کە بۆ لاشەی کەشتی بەکاردێترێ تا بەرلە پیس‌بوونی بگرێ: *antifouling paint* ۞ آنتی‌فولینگ

**antifreeze** /'æntifri:z/ *noun*
نەبەست، نەهێڵەبەست، دژبەست، دژەبەست ۞ ضد یخ

**antifriction** *noun*
دژەلێکخشان، دادەشکێنەوە بە بەرگرتن یان کەم‌کردنەوەی لێکخشان ۞ ضد اصطکاک

**antifungal** *adjective, noun*
کەڕووبەند، کارگ‌بەند، دژەکەڕوو، fungicidal، fungistatic ۞ ضد قارچ

**anti-g** = antigravity

**antigen** /'æntɪdʒən/ *noun*
ئەنتی‌ژێن، ئانتی‌ژێن، دژەژێن، دژەزێ: 1 مادە یان ماکێ کە لەش وەک بیگانەیێ دەیناسێتەوە و دەزگای پاراستنیش تاو دەدا، ماکێ کە دەتوانێ هانی بەرهەم‌هێنانی ئانتی‌بادی‌یەکان بدا و لەگەڵیان تێکەڵ بێ 2 ماکێکی بازرگانی کە کاتێ بۆ نێو شانەی ئاژەڵێ لێدرا یان مژرا، بەرهەم‌هێنانی ئانتی‌بادی‌یەکان تاو دەدا 3 ئانتی‌ژێنەکانی جۆرێکی تایبەتی (بە گشتی؛ antigenic *adj*: ئەنتی‌ژێنی، دژەژێنی، سەربە دژەزێ) ۞ پادگن

**antigenic deter,minant** = epitope

**antigestational drug** *noun*
دەرمانی دژەسکپڕی: دەرمانێ کە ڕێ لە هێلکەی پێتێنراو لە پێوەست‌بوون بە دیوارەی منداڵدانەوە دەگرێ ۞ داروی ضد بارداری

**Antigone** *noun*, Greek *Antigonē*
ئانتیگۆن، ئانتیگۆنی، ئانتیگۆنێ: کچی ئۆدیپوس

Oedipus و ژوکاستا Jocasta که بەرهەڵستی دەستووری خاڵی کریۆن Creon ی کرد بە راپەراندنی ریورەسمی ناشتنی براکەی Polynices ◌ آنتیگون، آنتیگونه

**antigorite** /an'tɪgərʌɪt/ *noun*
کانێکی کۆمەڵی serpentine، زۆرتر بە شێوەی تویی ناسک هەیە (بنەرەت: لە *Antigorio*، دۆڵێ لە Piedmont ئیتالیا + -ite[1]) ◌ آنتی‌گوریت

**antigravity** *noun*
(فیزیک) دژەراکێشان، دژەکێش، کاریگەری وادانراو لە ئەنجامی هەڵوەشاندنەوە یا کەمکردنەوەی بوار یا مەیدانی راکێشان gravitational field، هێزیکی وادانراو یان خەیاڵی کە بەهۆی ئەو تەنێکی بە بارستانی ئەرێنی، تەنێ بە بارستایی نەیینی رادەدا (یا دوور دەخاتەوە) ◌ آنتی‌گراویتی

**Antiguan** /an'tiːgwən/ *adjective, noun*
*adj* سەربە یان ئانتیگوا و باربودا Barbuda، لە دورگەکانی هیندی رۆژاوا West Indies، ئانتیگوایی *n* خەڵکی ئانتیگوا، یان ئانتیگوا و باربودا، ئانتیگوایی ◌ *adj* آنتیگوایی *n* اهل آنتیگوا

**antihemophilic factor** = factor VIII

**antihelix** *noun, pl.* antihelices or antihelixes
قوتکەی بەشی کرۆژەیی دەرەوەی گوێ ◌ آنتی‌هلیکس

**anti-hero** *noun, pl.* anti-heros (also anti-heroine)
دژەپاڵەوان، دژەقارەمان (کەسایەتییێکی سەرەکی بە رۆڵی خراپەوە) ◌ ضدقهرمان

**antihistamine** /ˌænti'hɪstəmiːn/ *noun, adjective*
دەرمانی دژەهەستیاری یان پێنەکەوتن (یان gastric ulcer ـەکان)، ئاوێتەیێکی پێکهێنراو کە کاری هیستامین رادەگرێ ( antihistaminic *adj*: سەربە یان پێوەندی بە ئانتی‌هیستامینەوە هەیە) ◌ آنتی‌هیستامین

**antihypertensive** *adjective, noun*
(دەرمانی) دژەبەستانی خوێن: کار دەکا تا بەستان یان گوشاری خوێنی لەسەرەوە کەم کاتەوە ◌ (داروی) ضد فشار خون

**Antillean** *adjective*
ئانتیلی: سەربە زنجیرە دورگەیێکی هیندی رۆژاوا کە بەسەر دوو بەشدا دابەش کراوە، یەکەمیان کوبا Cuba، هیسپانیۆلا Hispaniola، جامائیکا Jamaica و پۆرتوریکو Puerto Rico (ئانتیلی گەورە(تر) و دووهەمیان ڤیرجین Virgin، لیوارد Leeward و دورگەکانی ویندوارد Windward، ترینیداد Trinidad، باربادۆس Barbados، توباگۆ Tobago و دورگەکانی باشووری کارائیب و باکووری Venezuela دەگرێتەوە (ئانتیلی چکۆلە(تر) ◌ آنتیلی

**anti-infective** *adjective, noun*
*adj* دژەگرتن، دژەتەنینەوە، دەژتووشبوون *n* دەرمانی دژەگرتن ◌ *adj* ضد سرایت *n* داروی ضد سرایت

**anti-inflammatory** *adjective, noun*
(دەرمانی) دژەئاوسان، دژەهەوکردن، دژەسوێ، دژەسووربوونەوە ◌ (داروی) ضد التهاب

**ant inflation** *noun*
(ئابووری) دژەهەڵاوسان ◌ ضد تورم

**anti-intellectual** *adjective, noun*
*adj* دژەرۆشنبیر (سەبارەت بە چالاکی، روانگە و دلبەستەکانی) *n* کەسێکی دژەرۆشنبیر ◌ *adj* ضد روشنفکر *n* آدم ضد روشنفکر

**antiknock** *noun*
رۆنی دژەلێدان یا زەربەگیرەوە، رۆنی دژەپیاکێشان ◌ روغن ضد ضربه

**antileukaemic** *adjective*
دژی شێرپەنجەی خوێن، دژەلوکیمیا، بەرپەرچی کاریگەرییەکانی لوکیمیا دەداتەوە ◌ آنتی‌لیوکمیک

**antilife** *adjective*
1 دژی ژیانی ئاسایی 2 دژی هێزەکانی ژیان وەک لایەنگری لە لەباربردن یان کۆنترۆلی منداڵبوون ◌ 1 ضد زندگی عادی 2 آنتی‌لایف

**antilock brake** *noun*
وەستێنەی دژەقفڵ(بوون): وەستێنەیێ کە سازە بە دەزگایێ کە بە کامپیوتێر مەهاردەکرێ و رێ لە قفڵبوونی چەرخەکان دەگرێ ◌ نوعی ترمز

**antilogarithm** *noun,* also antilog
ئانتی‌لۆگاریتم: ژمارەیێ کە لۆگاریتمەکەی دراوە ◌ عکس لگاریتم

**antilogarithmic** *adjective*
سەربە ئانتی‌لۆگاریتم ◌ وابسته به عکس لگاریتم

**antilogy** /an'tɪlədʒi/*noun, pl.* antilogies
(کۆن) ناکۆکی، پێکدژی، دژبەیەکی ◌ تناقض

**antimacassar** /ˌantɪmə'kasə/ *noun*
پارچەی ژێرسەر یان پشتەوە (کورسی و مۆبل) ◌ آنتی‌ماکاسار

**antimagnetic** *adjective*
دژەمەگناتیس، مەگناتیس‌رەوێن ◌ ضدمغناطیس

**antimalarial** *noun, adjective*
(دەرمانی) دژەماڵاریا (بۆ بەرگیری و سارێژ) ◌ (داروی) ضدمالاریا

**antimatter** /'æntimætə(r)/ *noun*
(فیزیک) دژ(ە)ماک، دژەمادە، ماکی پێکهاتوو لە پارچۆلکەکان ◌ پادماده

**antimetabolite** *noun*
(کارئەندامناسی) دژەمیتابۆلیت: ئەو ماک یا مەتریالانەی کە رێ لە چالاکی میتابۆلیتێ دەگرن

دەخــشێنن یــان وەردەدەن تــا هێنــدێ مــاک و مــادەی کیمیــایی لە مێروولەکانەوە گــیر بخــەن (وەک formic acid) ◌ آنتینگ

**antinode** *noun*

(فیزیک) ناوچەیێ بە فراوانی amplitude تەویەر کە لە نێوان گرێ لێکنزیکەکان لە تەنێکی لەراوەدا هەڵکەوتووە (nodal *adj*-) ◌ آنتی‌نود

**antinomian** /antɪˈnəʊmɪən/ *adjective, noun*

*adj* ســـەربە بۆچـــوونی دەســـتەیێ لـــە کریـــستانیەتەکان کــە دژی رەچــاوکردنی بنــەما ناکاری‌یەکانن، چونکو پێیان وایە کە خوا لە هەر هەڵومەرجێکا بەتەنگیانەوەیە *n* کەسێ کە ئەو بۆچوونەی هەیە (nism *n*-) ◌ آنتینومین

**antinomy** /anˈtɪnəmi/ *noun, pl.* antinomies

ناکۆکی دوو قانوون یان دوو بنەما، پارادۆکس (antinomic or antinomical *adj*؛ بنەڕەت: لە لاتین، لە یۆنانی، لە *anti* "دژ" + *antinomia* *nomos* "قانوون") ◌ تناقض دو قانون یا دو اصل

**antinovel** *noun*

بەرهەم یان کاریکی چیرۆک کە تۆخمەکانی پێکهاتــەی نۆڤــێل وەک دارشــتن plot یــان پــەرەســەندنی کــەسایەتی تیانییــە، کــاریێ کــە زۆربــەی تایبــەتمەنــدی‌یــەکــانی نۆڤــێلی نییــە (antinovelist *n*) ◌ آنتی‌نوول

**antinuclear** *adjective*

1 دژەناوکی 2 دژی بەکارهێنان یا بەرهەم‌هێنانی هێزی ناوکی ◌ 1 ضد هستەای 2 آنتی‌نیوکلار

**antinucleon** *noun*

ئــانتی نیوکلیــۆن: دژەپارچۆلکــەی نیوکلیــۆن nucleon، ئــانتی‌پــرۆتێن antiproton یــان ئانتینیوترۆنێ antineutron ◌ آنتی‌نیوکلیون

**antinuke** = antinuclear 2

**antioxidant** *noun*

دژەدئۆکــسێن(ــەر): 1 مــەتریاڵ یــان مــاکی دژەژەنــگ 2 هــەوێنــە یــان مــاکێکی ئــەندامی تــر وەک ڤیتامین E یان beta carotene کە دەتوانێ بەرهەڵستی زیانلێکەوتنی کاریگەری‌یــەکانی ئۆکــسانی شانە گیانەوەری‌یەکان بکا، ماکێ کە بەرلە کاری ئۆکــسان دەکا ◌ 1 ضداکــساینده 2 آنتی اکسیدانت

**anti-orthodox** *adjective*

دژەئۆرســۆدۆکس، دژەئۆرتــۆدۆکس ◌ ضــد ارتدوکس

**antiparalel** *adjective*

دژەتەریب، ناهاوتەریب (هەریەک روویان لە لایێ بێ) ◌ آنتی‌پارالل

**antiparticle** /ˈæntipɑːtɪkl, US -pɑːrt-/ *noun*

دژەوردیلە، دژەپارچۆلکە ◌ پادذره

**antipasto** /ˌæntiˈpæstəʊ, US -oʊ/ = hors

و لــە ئــەنجــامدا کــاری میتــابۆلیزم رادەگــرن ◌ آنتی‌متابولیت

**antimetabolitic** *adjective*

ســەربە یان پێوەندی بە دژەمیتابۆلیتــەوە هــەیــە ◌ وابستە بە آنتی‌متابولیت

**antimissile** *adjective*

دژەمووشەک، مووشەکی بالیــستیک بۆ گەڕان و تیابردنی مووشەکە شەڕکەرەکان، بەکاردێنرێ بۆ بــەرگــری دژی مووشــەکــە ئاراســتەکــراوەکــانی دوژمن ◌ ضد موشک

**antimissile missile** *noun*

مووشەکی دژەموشەک، مووشەکی بالــستیک بۆ گەڕان و تیابردنی مووشەکە شەڕکەرەکان ◌ نوعی موشک

**antimitotic** *adjective, noun*

*adj* دابەش‌بەند: سەربە ماکێ کە دەتوانێ ڕەوتی دابەش‌بوونی خانە ڕاگرێ یان بەربەست بکا *n* مــاکێکی دابــەش‌بــەنــد وەک دەرمــان کــە بــۆ فەوتاندنی خانە شێرپەنجەکان بەکاردێنرێ ◌ آنتی‌میتوتیک

**antimonial** *adjective,* also antimonic or antimonious

سەربە ئەنتیمۆنی، خاوەنی ئانتیمۆنی، ئانتیمۆنی تیایــە، ب.ت. لــە دۆخێکــی پێنــج‌هــاوهێزیدا pentavalent یــا antimonous antimonious (ســەربە ئانتیمۆنی یان ئانتیمۆنی تیایە، ب.ت. لە دۆخێکی سێ‌هاوهێزیدا trivalent) ◌ وابــستە بە آنتیموان، داری آنتیمونی

**antimony** /ˈæntɪməni, US -moʊni/ *noun*

(کیمیــا) ئــەنتیمۆن (بــە ژ.گ. 51 ن. Sb) ◌ آنتیموان

**antimycin A** *noun,* also antimycin

جــۆرێ ئــانتی‌بیــۆتیکی بلــوورین $C_{28}H_{40}N_2O_9$ ب.ت. وەک مێرووکــوژ، کــرم‌کــوژ و تــەم‌کــوژ بەکاردێنرێ ◌ آنتی‌پلاستیک

**antineoplastic** *adjective, noun*

*adj* دژەپلاســتیک، بەرلە هــەڵدان و تەشــەنەی neoplasm یــان خانــەیێکــی تــری مــەترســی‌دار دەگرێ *n* ماکێکی دژەپلاستیک ◌ آنتی‌پلاستیک

**antineuritic** *adjective*

دژی ئاوســانی دەمــار، دژەدەمــارەئاوســێن ◌ آنتی‌نیوریتیک

**antineutrino** *noun, pl.* antineutrinos

ئانتی‌نیوترینۆ: دژەپارچۆلکەی نۆترینۆ neotrino ◌ آنتی‌نیوترینو

**antineutron** *noun*

ئانتی‌نیۆترۆن: دژەپارچۆلکەی نۆترۆن neotrin ◌ آنتی‌نیوترین

**anting** *noun*

هــەڵــس‌وکــەوت یــان ڕەفتــارێکی باڵــندەکانــە کــە لــەودا مێروولــەکــان خۆیــان لــە پــەڕوباڵــەکــەی

dœavre, *pl.* antipasti /-ti/

**antipathetic** /ˌæntɪpəˈθetɪk/ *adjective*
1 دژ، دوژمـــن، دژبـــەر، بەرهەڵـــست: *a*
*government -thetic to democracy* 2 بێزار،
بێزاوی، بێزەون ○ 1 مخالف 2 منزجر، نفرت‌انگیز

**antipathy** /ænˈtɪpəθi/ *noun, pl.* antipathies
1 بێزاری، قین، رق، بێزلێ‌هاتـەوە: *personal*
*mutual antipathy* ◊ *antipathy* 2 دژبەری،
بەرهەڵستی، دژایەتی ○ 1 تنفر، انزجار 2 تـضاد،
مخالفت

**antipersonnel** *adjective,* also anti-personnel
کـــەس‌کـــوژ، دژەکـــەس، وا دارێـــژراوە تـــا
ســەربازەکانی دوژمن لە نێو ببا یان لە کار بخا
(لەچاو دەزگا و کەل‌وپەلەکان) ○ ضد نفر

**antiperspirant** /ˌæntiˈpɜːspərənt, US -ˈpɜːrs-/ *noun*
(دەرمانی) بۆن‌بەر، دژەئارەق، نەهێڵەئارەق ○
ضد عرق

**antiphlogistic** *adjective, noun*
نیوەنمەک، دژەئاوسان، پێلەخە، دژی هەڵاوسان
یـان داگیرسـان و تـا، anti-inflammatory ○
آنتی‌فلوجستیک

**antiphon** /ˈantɪf(ə)n/ *noun*
1 سەندنەوە، پەرچ‌دانەوە، وەڵام 2 هۆنراوە یان
دەقێ کـە پێش یـان پـاش هێنـدێ بـەشـێکی
ڕێ‌وڕەسمی ئایینی دەخوێنرێتەوە یـان دەوترێ
○ 1 برگردان، پاسخ 2 آنتی‌فون

**antiphonal** *adjective, noun*
*adj* سـەندنەوەیـی، سـەربـە یـان پێـوەنـدی بـە
سـەندنەوە یان ئانتی‌فۆنەوە هەیە *n* antiphonary
یێ ○ آنتی‌فونال

**antiphonary** /anˈtɪf(ə)nəri/ *noun, pl.* antiphonaries
کتـێبی ئـانتی‌فۆنـەکـان، کتـێبی plainsong بـۆ
Divine Office ○ آنتی‌فوناری

**antiphony** /ˌænˈtɪfəni/ *noun, pl.* antiphonies
سرودی سـەندنەوە ○ سرود تهلیلی

**antiphrasis** *noun, pl.* antiphrases
بەکارهێنـانی وشـەیێ لە واتـایێکی دژ بە مانـای
گونجـاوی، ب.ت. لـەبـەر کاریگـەری تـەنزاوی
یـان پێکـەنینی (وەک this giant of 3 ironic
feet 4 inches) ○ آنتی‌فراسیس

**antiphrastic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بەئانتی‌فراسیـــوە هـەیـە ○
وابسته به آنتی‌فراسیس

**antiphrastically** *adverb*
لەباری یـان بـە شێوەیێکی ئانتی‌فراسیس ○ از
لحاظ یا به طور آنتی‌فراسیس

**antipodal** /ænˈtɪpədəl/ *adjective*
1 دژپێیـی، دژپـایی، هەڵـکەوتوو لـە خـالـی
بەرامبەری زەوی (یان مانـگ) دا 2 تەواو دژ ○
1 واقع در طرف مقابل زمین (یا ماه) 2 کاملاً مخالف

**antipodean** /ˌæntɪpəˈdiːən/ *adjective*
(Antipodean) ئەوسـتـرالیایی و نیوزیلەنـدی،
ســەربە ئەوسـترالیا و نیوزیلەنـد، پێـوەنـدی بـە
ئەوسترالیا و نیوزیلەندەوە هـەیـە ○ وابسته بـه
استرالیا و زلاندنو

**antipodes** *noun, pl.*
1 دژپـێ، دژپـا، دژەپـا، دوو خالـی بەرامبـەر 2
کـەسـێ کـە لـە خالـی بـەرامبـەری زەوی‌دا
نیشتەجێ‌یە ○ 1 دو نقطه‌ی متقابل 2 آنتی‌پودز

**the Antipodes** /ænˈtɪpədiːz/ *noun*
1 ئەوســترالیا و نیوزیلەنـــد 2 ناوچـــەکانی
ئەوسترالیایی لـە پێوەنـدی لەگـەڵ ئـەوروپادا 3
(antipodes) دژپێ، دژپا، دوو خالی بەرامبـەر
○ 1 استرالیا و زلانـدنو 2 منـاطق استرالیایی در
رابطه با اروپا 3 (با a) دو نقطه‌ی متقابل

**antipollution** *noun, adjective*
دژەپۆلوشن، دژەپیسی، پیسی‌ڕەوێن، وا دارێژراوە
تا بەرلە پیسی بگرێ یان نەیهێڵێ ○ ضد آلودگی

**antipollutant** *noun*
(مـەتریاڵ) دژەکـەش‌پیـسی، پیـسی‌بـەر،
دژەپولوتێنت ○ ضد آلودگی

**antipope** *noun*
کەسێ کە هەڵبژێردراوە یان پێی وایە ببێ بە پاپ
بە دژی ئەو پاپەی کە بە شێوەیێکی قانوونی
هەڵبژێردراوە ○ آنتی‌پاپ

**antiproton** /ˈæntiprəʊtɒn, US -proʊtɑːn/ *noun*
دژەپرۆتۆن، دژەپارچۆلکـەی پرۆتـۆن ○ ضـد
پروتون

**antipruritic** /ˌantɪprʊˈrɪtɪk/ *adjective, noun*
(دەرمانی) دژەخارشت، دژەخورین، دژەئاڵۆش
○ (داروی) ضد خارش

**antipsychotic** *adjective, noun,* also neurolcptic
*adj* سـەربـە ئـەو دەرمانانـە کـە بـۆ چـارەسـەری
psychosis ب.ت. شیزوفرنیا و دۆخە ئاستەم و
سەختەکانی مانیا mania، دڵتەنگی depression
و یان پارانۆیا paranoia بەکاردێنرێ *n* دەرمانی
دژی دەروون‌تێکچـوویی (وەک phenothiazine
و butyrophenone ـــــەکـــــان) ○ *adj*
آنتی‌سایکوتیک *n* داروی آنتی‌سایکوتیک

**antipyretic** *adjective, noun*
(دەرمانی) دژەتا، تاڕەوێن، تاپەڕێن، تاشکێن ○
(داروی) ضدتب، تب‌بُر

**antiquarian** /ˌæntɪˈkweəriən, US -ˈkwer-/ *adjective*
1 (سـەربە) ئەنتیکەناسـی یـان کۆنینەناسـی 2
(سـەربە) کتێبـە دەگمەنـەکان ○ 1 وابسـته بـه

عتیقەشناسی 2 آنتیکوارین

**antiquary** /'æntıkwəri, US -kweri/ *noun* *(pl.* antiquaries*)*, also antiquarian
ئەنتیکەناس، کۆنینەناس، ئەنتیکەگەر، کەسێ کە شتی ئەنتیکە کۆ دەکاتەوە ◌ عتیقەشناس

**antiquated** /'æntıkweıtıd/ *adjective*
کۆن، قەدیمی، لەباوکەوتوو، بێبرەو، بێباو، سوواو ◌ قدیمی، منسوخ

**antique** /æn'ti:k/ *adjective, noun*
*adj* ئەنتیکە، کۆن، باستانی، زووینە، لەمێژینە: *an antique mahogany desk* *n* شوێنەواری کۆن، ئاسەواری دێرینە: *Priceless antiques were destroyed in the fire* ◌ *adj* عتیق، باستانی، قدیمی *n* اثر باستانی

**antique shop** *noun*
(دووکانی) ئەنتیکەفرۆشی ◌ عتیقەفروشی

**antiquity** /æn'tıkwəti/ *noun, pl.* antiquities
1 کۆنینەیی، کۆنی، کەڤناری، زووینی، دێرینە 2 سەردەمانی کۆن یان باستان (یۆنان و رۆم) 3 شوێنەوار یان ئاسەواری (سەردەمی) کۆن: *Egyptian/Roman antiquities* ◌ 1 قدمت 2 دوران باستان 3 اثر باستانی

**antiresonance** *noun*
دژەزرنگانەوە، نەزرنگاوە ◌ ضد طنین

**antirrhinum** /ˌæntı'raınəm/ *noun,* also snapdragon, *pl.* antirrhinum
(رووەکناسی) دەمەشێر، گوڵەئاخ، گوڵەئاوات، زارەگا [تۆخم *Antirrhinum*] ◌ گل میمون

**antisatellite** *adjective*
(چەک) دژەساتەلایت، ساتەلایتشکێن ◌ آنتیساتلیت، ضدماهوارە

**antiscorbutic** *adjective, noun*
(دەرمان یان خۆراکی) دژەسکێرڤی، دژەسکۆربوت: *the antiscorbutic vitamin is vitamin C* ◌ (دارو یا غذا) ضد اسکوربوت

**anti-Semite** /ˌænti 'si:maıt/ *noun*
کەسێکی دژەجوولەکە: *He was a notorious - Semite* ◌ آدم یهودستیز

**anti-Semitic** /ˌænti sə'mıtık/ *adjective*
دژەجوولەکە: *anti-Semitic propaganda* ◌ یهودستیز

**anti-Semitism** /ˌænti 'semətızəm/ *noun*
دژەسێمیتیزیم، دوژمنایەتی لەگەڵ جوولەکە ◌ یهودستیزی

**antisense** *adjective*
(بۆماوەناسی) دژەواتا، دژواتا، ئانتیسێنس: سەربە ژێنێ کە لە RNA یان DNA تەواوکەر بەرهەم هاتووە، زنجیرەیێ لە دیئێنئەی کە ریزێ لە نۆکلیۆتیدەکانی nucleotide هاوشێوەی mRNA هەیە (بڕوانە nonsense و missense) ◌ آنتیسنس

**antisepsis** /ˌænti'sepsəs/ *noun*
خاوێنکردنەوە، پاکژکردنەوە، گەندسڕی (بڕوانە asepsis) ◌ گندزدایی

**antiseptic** /ˌænti'septık/ *noun, adjective*
*n* (مەتریاڵ) خاوێنکەر، بۆگەنبەر، گەندسڕ، پیسیبەر *adj* (سەربە) خاوێنکردنەوە ◌ *n* (مادە) گندزدا *adj* (وابستە بە) گندزدایی

**antiserum** *noun, pl.* antisera or antiserums
دژەخوێناوگ، دژەسیرۆم: خوێناوگ یان سیرۆمی ئانتیبادیدار، سیرۆمی مرۆڤ یان ئاژەڵ کە ئانتیبادییەکانی تیایە (بۆ نەخۆشییێکی تایبەتی)، لێدەدرێ بۆ چارەسەرکردن یا پاراستن بە دژی نەخۆشی تایبەتییەکان ◌ آنتیسروم

**antislavery** *adjective, noun*
*adj* دژ بە کۆیلەداری، دژی کۆیلەداری *n* دژایەتی (لەگەڵ) کۆیلەداری ◌ *adj* بردگیستیز *n* مخالفت با بردەداری

**antisocial** /ˌænti'səʊʃl, US -'soʊʃl/ *adjective, noun*
*adj* 1 دژی دابونەریتی کۆمەڵ و مایەی هەراسانی خەڵکانی تر، دژەکۆمەڵ، دژی کۆمەڵ(گا)، دژی بەرژەوەندی کۆمەڵ(گا)، ناکۆمەلایەتی، دوژمنی کۆمەڵ، گۆشەگیر، لاتەریک، دوورەپەرێز 2 (Psychiatry) = sociopathic *n* کەسێ کە تایبەتمەندی دژەکۆمەڵی هەیە ◌ *adj* جامعەستیز، غیراجتماعی *n* آنتیسوسیال

**antisocially** /ˌænti'səʊʃli, US -'soʊʃl/ *adverb*
بە شێوەیێکی دژەکۆمەڵ یان دژی کۆمەڵ(گا)، ناکۆمەلایەتییانە، گۆشەگیرانە، لاتەریکانە ◌ بە طور جامعەستیز یا غیراجتماعی

**antispasmodic** *adjective, noun*
*adj* دژەکرژی، کرژیڕەوێن *n* دەرمانی دژەکرژی یان کرژیڕەوێن ◌ *adj* ضد تشنج *n* داروی ضد تشنج

**antistatic** *adjective, noun,* also antistat (also anti-static)
دژی ئێلیکتریسیتەی وێستاو static electricity: ئێلیکتریسیتەی وێستاو کەم دەکاتەوە، لای دەبا یان بەری دەگرێ ◌ ضد اکتریستەی ساکن

**antisterility vitamin** = tocopherol

**antistrophe** /an'tıstrəfi/ *noun*
1 دووبارەبوونەوەی وشەکان بە شێوەیێکی پێچەوانە یان بەراوەژوو 2 دووبارەبوونەوەی وشە یان دەستەوشەیێ لە کۆتایی کلۆزە یەکلەدوایەکهاتووەکان successive دا 3 جووڵان یان بزاوتێکی گەڕانەوەیی (لە چەپەوە بۆ ڕاست) لە سەمای کۆراڵی choral دروست لە وەڵامی ستڕۆفێکی پێشوو 4 سەندنەوەی دەستەی

کـۆرس یـان کـۆربێژانی کلێـسه 5 (لـه یۆنـانی کۆن‌دا) بەشـی دووهـەمـی هـۆنراوەی گـۆرانی بـه کۆڕ یان کۆرس (بڕوانه strophe) ◇ آنتی‌استروف

**antistrophic** *adjective*

سـەربه یان پێوەندی به ئانتی‌ستڕۆفەوه هـەیه ◇ وابسته به آنتی‌استروف

**antistrophically** *adverb*

ئانتی‌ستڕۆفانه، به شێوەیێکی ئانتی‌ستڕۆف(ەوه) ◇ به طور آنتی‌استروف

**antisubmarine** *djective*

دژەژێردەریـایی، ژێردەریـایی‌شـکێن ◇ ضـد زیردریایی

**anti-tank** /ˌæntɪ ˈtæŋk/ *adjective*

(چـەک‌وچـۆڵ) دژەتانـک، تانـک‌شـکێن: *anti-tank missiles/mines* ◇ ضد تانک

**anti-theft** /ˌæntɪ ˈθeft/ *adjective*

دزگر، دژەدز، دزبەند ◇ دزدگیر

**antithesis** /ænˈtɪθəsɪs/ *noun, pl.* antitheses /-siːz/

1 دژ، بەرامبـەره، خالـی بەرامبـەر 2 نـاکۆکی، دژایەتی، دژبەیەک‌بوون، پێک‌دژی، بەرامبەرێتی 3 (لـه فەلـسەفەی هێگێـل‌دا) ئـەنتی‌تێـز (بڕوانـه synthesis؛ بنـەڕەت: لـه late Latin، لـه یۆنـانی *antitithenai* "دانـان (بـه) دژی") ◇ 1 عکس، ضد 2 تضاد، تقابل 3 برابرنهاد

**antithetical** /ˌæntɪˈθetɪkl/ *adjective,* also antithetic

دژبەیەک، پێک‌دژ، ناکۆک ◇ متـضاد، ناسـازگار، ضد و نقیض

**antithetically** /ˌæntɪˈθetɪkli/ *adverb*

ناکۆکانه، پێک‌دژانه ◇ به طور متضاد

**antitoxic** *adjective*

دژەژار، ژارڕەویـن، ژاربـەڕیـن، دژەدەرمـان، کاریگەری ژاراوی‌یەکان پووچ دەکاتەوه ◇ ضد سم

**antitoxin** *noun*

دژەژار، دژەدەرمان، ژارڕەوێن، ژاربڕ ◇ پادزهر

**antitrade** *noun, adjective*

*n* (antitrades) دژەبەرژەوەندباکان؟ *adj* سەربه به دژەبەرژەوەندباکان ◇ *n* بادهای واسـامان *adj* وابسته به بادهای واسامان

**antitrust** /ˌæntiˈtrʌst/ *adjective*

(له ئەمریکا) دژەتراست، دژەپاوان ◇ ضد تراست

**antitruster** *noun*

دژەتراست‌خواز، دژەپاوان‌خواز، ئانتی‌تراستێر ◇ آنتی‌تراستر

**antitrust laws** *noun, pl.*

(لـه ئـەمریکا) قانوونـەکانی دژەتراسـت، قانوونـه دژەپاوانەکان ◇ قوانین ضد تراست

**antitussive** *adjective, noun*

*adj* کۆخەڕەوێن، دژی کۆخه، سەربه ماکێ که بـۆ دامرکانـدنی کۆخـه بـەکـاردێنرێ *n* مـاکی کۆخەڕەوێن ◇ (مادەی) ضد سرفه

**antitype** *noun*

(کـەس یـا شـتێ) سـەرنموونه، نموونـەی شـتێ، نموونەی سەرەکی ◇ مصداق

**antitypical** *adjective,* also antitypic

سەرنموونه، نموونەی شتێ، نموونـەی سـەرەکی ◇ مصداق

**antiutopia**, *pl.* antiutopias = dystopia

**antivenin** /ˌantɪˈvɛnɪn/ *noun,* also -tivenom

ئـانتی‌ڤێنین، ئانتـیڤێنۆم، دژەژاراوکـێ بـۆ ژارێ، ئانتی‌سـیرۆمێ کـه دژەژاراوکێکی وای تیایه، بۆ ئـەوانـه بـەکـاردێنرێ کـه بـه ژارێکـی ئاسـتەم پێوەدراون، دژەخوێناوگ یـان ئانتی‌سیرۆمێ کـه ئانتی‌بادی‌یـەکـانی دژی هێنـدێ کەسـێ تایبـەتی تیایه ◇ آنتی‌ونین

**antiviral** /ˌæntiˈvaɪrəl/ *adjective*

(پزشـکی، لـەمـەڕ دەرمـان یـان چارەسـەری‌یـێ) دژەڤایرۆس، کاریگەره بەدژی ڤایرۆسـەکـان ◇ پادویروس

**antivirus** *adjective*

(کـامپیوتێر) دژەڤـایرۆس، ڤـیروس‌کـوژ ◇ ضـد ویروس

**antivitamin** *noun*

ماکـێ کـه کاریگـەری ڤـیتامینەکـان (لـەبـاری میتابۆلیکـەوه) لـه کـار دەخـا، مـاک یـان مـادەی دژەڤیتامین، ڤیتامین‌ڕەوێن ◇ ضد ویتامین

**antivivisection** *adjective*

دژەزیندەتوێکاری، دژی بـەکارهێنـانی گیانـەوەره زینـدووەکان بـۆ توێژینـەوەی زانـستی ◇ آنتـی ویوی‌سکشن

**antivivisectionism** *noun*

دژەزیندەتوێکاری‌گەری ◇ آنتی ویوی‌سکشنیسم

**antivivisectionist** *noun*

دژەزیندەتوێکاری‌گەر ◇ آنتی ویوی‌سکشنیست

**antler** /ˈæntlə(r)/ *noun*

1 شـاخی گـاکێوی یـان نێراسـک 2 یـەکێ لـه شـاخەکانی گـاکێوی (antlerless *adj*) ◇ 1 شاخ گوزن 2 یکی از شاخ‌های گوزن

**antlered** *adjective*

شـاخدار (گاکێوی و هتد) ◇ شاخ‌دار

**ant lion** *noun*

(مێروونـاسـی) شـێرەمێروو(لـه)، مێرووێـێ کـه شـێوەی پـووش‌بەقوونـه دەدا [خێـزان Myrmeleontidae] ◇ آسیابانک

**antonym** /ˈæntənɪm/ *noun*

وشەی واتادژ ◇ واژەی متضاد

**antonymous** *adjective*

واتادژ ◇ متضاد

**antral** *adjective*

1 سـەربه چـاڵ، کـون یـان بۆشـایی ئێـسکێ 2

سەربە ئەشكەوتە (بنەڕەت: لە *antron* يۆنانى "ئەشكەوت cave") ◌ وابستە بە آنتروم

**antre** /'æntə(r)/ *noun*

ئەشكەوت، كەورگ ◌ غار

**antrectomy** /an'trɛktəmi/ *noun, pl.* -mies

ئەشكەوتەبڕی، دەرهێنانى كۆتايى دەرگاوانەى گەدە ◌ آنتركتومى

**antrum** /'antrəm/ *noun,pl.* antra /-trə/

1 (تويكارى) چاڵ، كون يان بۆشايى ئێسكێ 2 ئەشكەوتە، كۆتايى دەرگاوانەيى pyloric گەدە (بنەڕەت: لە لاتين، لە *antron* يۆنانى "cave") ◌ آنتروم

**antsy** /'æntsi/ *adjective* (antsier, antsiest)

پشووتەنگ، بێ تاقەت، بێ سەبر، كەم تاقەت ◌ ناشكيبا

**Anura** /ə'njʊərə/ *noun, pl.*

(گيانەوەرناسى) بێ كلكان، بۆقان، تیرەبۆق (دەستەيێ لە وشكاوەكييە amphibian بێ كلكەكان كە frog و toad ـەكان دەگريتەوە؛ بنەڕەت: لە -an[1] + *oura* يۆنانى "كلك") ◌ آنورا

**anuran** *noun, adjective*

گيانەوەرى بێ كلك ◌ آنوران

**anuresis** *noun*

ميزبەند، ميزگيران ◌ انحباس بولى

**anuria** /ə'njʊərɪə/ *noun*

(پزشكى) گرفت يان كێشە لە كردنى ميزدا، ميزەگرانە ◌ آنوريا

**anuric** *adjective*

تووشبوو بە گرفت يان كێشە لە كردنى ميزدا ◌ آنوريک

**anus** /'eɪnəs/ *noun*

كۆم، كونى كۆم، زرتک، پندرۆ، ڕەش، تريزە، كۆقک (بنەڕەت: لە لاتينەوە، لە بنەڕەتا بە واتاى "ئاڵقەيێ") ◌ مقعد

**anvil** /'ænvɪl/ *noun*

1 دەزگا، سندان، زيندان، مێخ سندان 2 ئێسكى دەزگا(يى)، ئێسكۆلكەى دەزگايى، = incus ◌ 1 سندان 2 استخوان سندانى

**anxiety** /æŋ'zaɪəti/ *noun, pl.* anxieties

1 دڵەتەپە، دڵەخوريێ، دڵەڕاوكێ، خەتەرە، نگەرانى، نارەحەتى، خەم، پەريشانى، نارامڵێ هەڵگيراوى 2 تامەزرۆيى، گوڕوتين، پەرۆش، مەراق ◌ 1 اضطراب، دلشوره، تشويش 2 اشتياق

**anxiolytic** /ˌaŋzɪə'lɪtɪk/ *adjective, noun*

(پزشكى، دەرمانى) دژەدڵەتەپە ◌ (داروى) ضد اضطراب

**anxious** /'æŋkʃəs/ *adjective*

1 بێ ئۆقرە، نارامڵێ هەڵگيراو، نارەحەت، بەخەتەرە، بزاڵ، پڕدڵەڕاوكێ، پەريشان، نيگەران: *an anxious look/face/expression*

2 بەتەنگەوە، تامەزرۆ، بەتين، بەپەرۆش ◌ 1 مضطرب، دلواپس، نگران كننده 2 مشتاق

**anxiously** /'æŋkʃəsli/ *adverb*

بە نگەرانى(يەوە): *to ask/look/wait anxiously* ◌ با تشويش

**anxiousness** /'æŋkʃəsnəs/ *noun*

نگەرانى، دڵەتەپێ، دڵەخوريە، پەريشانى، بزاڵى ◌ تشويش، نگرانى

**any** /'eni/ *adjective, adverb, pronoun*

هيچ چەشنە، هيچ كەس، هيچ كەسێ، هەركەس، هەموو كەس، هەركەسێ، هيچ يەک، هەر، هەريەک، هەركام، ئيدى، ئيتر: *I didn't eat any meat* ◊ *He forbids any talking in class* ◊ *Any colour will do* ◌ هيچ گونه، هيچ كس، هيچ يک، هيچ كدام، هر، هريک، هركدام، ديگر

**anybody** /'enibɒdi, US -bʌdi, -bɑ:di/ *pronoun*

هيچ كەس، كەسێ، هەركەس، هەركەسێ: *Is there anybody who can help me?* ◌ كسى، هيچ كس، هركسى

**anyhow** /'enihaʊ/ *adverb, adjective*

هەرچۆنێ بێ، هەرچۆنێ،هەرچۆنێ بوو، بە هيچ جۆرێ، لە هيچ ڕێگايەكەوە، بەهەر شێوەيەک، بەهەر چەشنێک، بە نارێکوپێكى، بەشپرزەيى: *She piled the papers in a heap on her desk, just anyhow* ◌ در هر صورت، در هر حال، بارى، به هيچ وجه، . هر طورى شده بود، درهم و برهم

**anymore** *adverb*

ئيدى، ئيتر، لەوە زياتر، لەمە زياتر، هيچى تر، چيتر، ئێستا، نووكە، جارێ، لەم دەموودەستەدا، ئەمڕۆژانە: *She doesn't live here any more* ◌ ديگر، بيش از اين، اكنون، اين روزها، فعلاً

**anyone** /'eniwʌn/ *pronoun*

هيچ كەس، كەسێ، هەركەس(ێ): *Is anyone there?* ◌ كسى، هيچ كس، هركس، هركسى

**anyplace** /'enipleɪs/ = anywhere

**anything** /'eniθɪŋ/ *pronoun*

شتێ، هەرشتێ، هەرچى (بێ)، كارێ، هيچ كارێ، هەركار،هيچ شتێ: *Would you like anything else?* ◌ چيزى، هرچيز، هرچيزى، هرچه، هيچ چيز، كارى، هركارى، هيچ كار

**anytime** *adverb*

هەميشە، هەركات، هەروەخت، هەرسات، هەردەم: *Call me any time* ◌ همواره، هروقت

**anyway** /'eniweɪ/ *adverb*

بەهەر شێوەيێ، بەهەرچەشنێ، هەرچۆنێ بێ، بە هەر لەونێ، بەهەرجۆرێ، لەگەڵ ئەمەش، سەرەڕاى ئەمەش، besides: *It's too late now, anyway* ◌ در هر صورت، در هر حال، بارى، با اين همه

**anywhere** /'eniweə(r), US -wer/ *adverb*
بۆ هەر کوێ، لە هەر شوێنێ، لە هەر جێیێ، هەر شوێنێ، هەر شوێنێ کە، هیچ کوێیێ، هیچ‌جێیێ، هەر شوێنێکی تر، جێگایێ، شوێنێ: *I can't see Did you go anywhere ◊ it anywhere interesting?* ◌ جایی، هرجا، هرکجا، در هر کجا، هر جایی که، هر جایی دیگر، هیچ‌جا

**anywise** = anyhow

**Anzac** *noun*
1 سەرباز لە ئەوسترالیا و نیوزیلەند، ئەنزاک (1914-1918) 2 (تافەرمی) کەسێ لە ئەوسترالیا یان نیوزیلەند ◌ انزاک

**ao dai** /'aʊ ˌdʌɪ/ *noun*
ئاو دای: جۆرێ تونیکی tunic ژنانەی قۆڵدرێژی خۆماڵی ڤیێتنامی ◌ آودای

**A-OK** *adjective, adverb,* also A-okay
باش، چاک، زۆر چاک، یەکجار باش ◌ خوب، بسیار خوب

**aorist** /'eɪərɪst, US 'ɛ:r-/ *adjective, noun*
(ڕێزمان) *adj* سەربە سەردەمی ڕابردووی دیاری‌نەکراو (ب.ت. لە یونانی‌دا) *n* وشەیێ لە سەردەمی ڕابردووی دیاری‌نەکراوا ◌ آئوریست

**aorta** /eɪ'ɔ:tə, US eɪ'ɔ:rtə/ *noun*
شاخوێن‌بەر، ئێئۆرتا، ئائۆرت (ئارتێری artery سەرەکی، کە خوێن لە لای چەپی دڵەوە بۆ تەواوی لەش هەڵدەگرێ) ◌ آئورت

**aortal** *adjective,* also aortic
ئائۆرتی، سەربە یان پێوەندی بە شاخوێن‌بەرەوە هەیە ◌ آئورتی

**aoudad** /'ɑ:ʊdad/ = Barbary sheep

**ap** = apo

**apace** /ə'peɪs/ *adverb*
(ویژەیی) بەهەشتاو، بەپەلە، خێرا، بەگورجی، تونـد، زوو، quickly ،swiftly: *growing apace* ◌ شتابان

**Apache** /ə'pætʃi/ *noun, pl.* same or Apaches
1 ئاپاچی (= ئەندامی ڕەسەنی گەلی سوورپێستی باشووری ڕۆژاوای ئەمریکا، کە زۆربەیان لە نیومەکسیکۆ و ئاریزۆنا دەژین) 2 زمانی Athabaskan ی ئەو گەلە (بنەڕەت: لە Zuñi ی‌یەوە "دوژمن") ◌ آپاچی

**apanage** = appanage

**apart** /ə'pɑ:t, US ə'pɑ:rt/ *adverb, adjective*
دوور، جیا، لێک‌جیا، لەیەک دوور، بەمەودایێکەوە، لەپاڵ، لەکن، لەلای، لای، تەنیا، بەتەنیایی، سەرەڕای، زیدەباری ◌ جدا، جدا از هم، در کنار، سوا، تنها، علاوه بر، صرف‌نظر از

**apart from** *preposition*
سەرەڕای، بێجگەلە، جیا لە ◌ علاوه بر، به غیر از

**apartheid** /ə'pɑ:taɪt, -eɪt, US ə'pɑ:rtaɪt, -eɪt/ *noun*
جیاوازی ڕەگەزایەتی (لە ئەفریکای باشووری: ئەورووپایی لە نائەورووپایی) ◌ تبعیض نژادی

**apartment** /ə'pɑ:tmənt, US ə'pɑ:rt-/ *noun*
1 دەستەژوور، دەستەخانوو، باڵاخانە، وارخان 2 ژوور، دیو ◌ 1 آپارتمان 2 اتاق

**apartment block** *noun,* also apartment building
(لە بریتانیا) بلۆکی نیشتەجێ‌بوون ◌ بلوک مسکونی

**apartment house** *noun*
(لە ئەمریکا) خانوویەکی ئاپارتمانی چکۆلە، وارخان ◌ بلوک مسکونی

**apathetic** /ˌæpə'θetɪk/ *adjective*
کەمتەرخەم، نادەربەست، بێ‌دەربەست، دڵسارد، ساردوسڕ، دڵمردوو، بێ‌تاقەت، خەمسار، ناهومێد، بێ‌هیوا، بێ‌هەست ◌ بی‌تفاوت، مأیوس، بی‌اعتنا، بی‌احساس

**apathetically** /ˌæpə'θetɪkli/ *adverb*
بە ساردی‌یەوە، بە کەمتەرخەمی‌یەوە، کەمتەرخەمانە ◌ با بی‌اعتنایی

**apathy** /'æpəθi/ *noun, pl.* apathies
کەمتەرخەمی، بێ‌دەربەستی، بێ‌هەستی، بێ‌تاقەتی، دڵمردوویی، ساردوسڕی، خەمساری، ناهومێدی، دڵساردی، ناهۆگری، ناتامەزرۆیی، بێ‌هیوایی ◌ بی‌تفاوتی، بی‌اعتنایی، بی‌احساسی، یأس، ناامیدی

**apatite** /'apətʌɪt/ *noun*
فێلە، کانێکی ئەرخەوانی یان سەوزی کاڵ، زۆرتر فۆسفاتی کالسیۆمی تیایە [بنەڕەت: لە یونانی *apatē* "فێل"] ◌ آپاتیت

**apatosaurus** /əˌpatə'sɔ:rəs/ *noun*
فێلە(مار)مێلکە: دایناسۆرێکی کەتەی گیاخۆری دوایی‌یەکانی قۆناخی ژووراسیک، بە مل و کلکی درێژەوە (بنەڕەت: لە *apatē* یونانی "فێل" (لەبەر ئەو لێکچوونە فریودەرەی نێوان هێندێ لە ئێسکەکانی ئەم دایناسۆرە و هی دایناسۆرێکی تر + *sauros* "مارمێلک") ◌ آپاتوسوروس

**ape** /eɪp/ *noun*
1 مەیموونی شێوەمرۆڤ، gorilla، chimpanzee، orang-utan و gibbon ـەکان دەگرێتەوە [خێزانەکانی Pongidae و Hylobatidae] 2 لاسایی‌کەرەوە ◌ 1 ایپ، میمون انسان‌نما 2 مقلد

**apeak** /ə'pi:k/ *adjective, adverb*
ڕاست، قیت، قنج، بە ڕەپی ◌ عمودی، قائم

**ape-man** /'eɪpmæn/ *noun, pl.* ape-men, also apeman
مرۆڤـمەیموون، مرۆڤی شێوەمەیموون ◌

انسان-میمون

**aperient** /ə'pɪərɪənt/ *noun, adjective,* also laxative

(دەرمان) رەوانی، رەوانکەر، سکڕەوێن ◇ (دارو) ملین

**aperiodic** *adjective*

(پتر فیزیک) ناڕێک، ناڕێکوپێک، ناسووری، aperiodically ) *aperiodic floods* :irregular (aperiodicity *n* ،*adv* ◇ نامنظم، غیرادواری

**aperitif** /əˌperə'tiːf/ *noun*

ئەپێریتیف، ئیشتیاکەرەوە (خواردنەوەی ئەلکوڵی) ◇ اپرتیف

**aperture** /'æpətʃə(r), US -tʃʊr/ *noun*

1 کون، قەڵەش، کەلەبەر، کەلێن، دەلاقە، رۆچنە، رۆزنە، دەریچە 2 کونەڕووناکی (بنەڕەت: لە aperture لاتین، لە -aperire ،apert "کردنەوە، ئاوالاکردن") ◇ 1 روزنە، شکاف 2 دیافراگم

**apery** /'eɪpəri/ *noun*

(کۆن) لاسایی پڕوپووچانە ◇ تقلید مسخرە

**apetalous** /eɪ'pet(ə)ləs, US ə-/ *adjective*

(رووەکناسی) بێپەڕە، هیچ پەڕەیێکی نییە ◇ بدون گلبرگ

**apex** /'eɪpeks/ *noun, pl.* apexes or apices /'eɪpɪsiːz/

1 سەر، تەوق، نووچکە، نووک، چڵۆک، چلەپۆپە، ترۆپک، لووتکە 2 بەرزترین ئاستی hierarchy یێ (بنەڕەت: لاتین "tip ،peak") ◇ رأس، تارک، اوج

**aphasia** /ə'feɪziə/ *noun*

قسەپێنەکراوی، ئێفێزیا، ئێفازیا، ئافازی (لە ئەنجامی لێدرانی مێشکییەوە) ◇ زبانپریشی

**aphasic** *adjective, noun*

*adj* ئێفازیک *n* نەخۆشی تووشبوو بەو دەردە و قسەپێنەکراو ◇ *adj* زبانپریش *n* بیمار مبتلا بە زبانپریش

**aphelion** /ap'hiːlɪən/ *noun, pl.* aphelia /-lɪə/

(ئەستێرەوانی) دوورگە، بەرامبەر بە perihelion ◇ افلیون

**apheresis** /ə'fɪərɪsɪs/ *noun, pl.* aphereses, also pheresis

1 (زمانەوانی) لابردنی دەنگی سەرەتای وشەیێ، وەکوو *he's* کە *he is* گۆدەکرێ 2 (پزشکی) شێوەیێ بۆ لابردنی ماکێ لە خوێن ◇ افرسیس

**aphesis** /'afɪsɪs/ *noun*

(زمانەوانی) لەدەسدانی بەرەبەرەی بزوێنێکی بێزەبر لە سەرەتای وشەیێ (ب.ت. *e* لە *esquire* کە بۆتە *squire*) ◇ افسیس

**aphetic** /ə'fetɪk/ *adjective*

سەربە ئەفیسیس ◇ وابستە بە افسیس

**aphetically** /ə'fetɪkli/ *adverb*

لەباری ئەفیسیس(ەوە) ◇ از لحاظ افسیس

**aphicide** /'eɪfɪsʌɪd/ *noun*

مێرووکوژی شۆکەکوژ، شەتەکوژ، مێشوولەفەوتێن، سوونکوژ ◇ شتەکش

**aphid** /'eɪfɪd/ *noun*

شۆکە، شەتە، مێشوولە، مێشگەزۆ، سوون، شیلەمژە [*Aphis* و توخمەکانی تر، زۆر جۆرن] ◇ شتە

**aphis** /'eɪfɪs/ *pl.* aphides /-diːz/ = aphid

**aphonia** /eɪ'fəʊnɪə, US ə-/ *noun,* also aphony /'af(ə)ni/

بێدەنگی، دەنگنەمان (لە ئەنجامی شەپلە لە پەتکە دەنگییەکاندا؛ بنەڕەت: لاتینی نوێ، لە *aphōnia* یۆنانی، لە *aphōnos* "بێدەنگ") ◇ بیصدایی

**aphonic** *adjective*

بێدەنگ ◇ بیصدا

**aphorism** /'æfərɪzəm/ *noun*

1 پەند، فەرموودە، قسەی کورتوپوخت، قسەی نەستەق، بژاردەگوتە؛ 2 adage پێناسەیێکی گشتگیر و کورت (و پوخت؛ بنەڕەت: لە *aphorisme* فەرەنسی یان *aphorismus* late Latin، لە *aphorismos* یۆنانی "definition") ◇ کلمات قصار، گزینگویە، اندرز، حکمت

**aphorist** /'æfərɪst/ *noun*

پەندبێژ، پەندنووس، ئافۆریست ◇ آفوریست

**aphoristic** /ˌæfə'rɪstɪk/ *adjective*

1 ئافۆریستیک، پەندبێژانە، حەکیمانە، پڕ لە پەند، پڕ لە قسەی نەستەق، پڕفەرموودە، پەند یان بژاردەگوتەی تیایە 2 پوختە ( aphoristically *adv*) ◇ 1 آفوریستیک 2 موجز

**aphrodisia** *noun*

ئەفرۆدیسیا، ئارەزووی سێکسی ◇ افرودیسیا

**aphrodisiac** /ˌæfrə'dɪziæk/ *adjective, noun*

*adj* بزوێنەری ئارەزووی سێکسی: *a powerful aphrodisiac n* (دەرمان، خۆراک یان مەتریاڵی) بزوێنەر: *the aphrodisiac qualities of ginseng* (بنەڕەت: لە *aphrodisiakos* یۆنانی، لە *aphrodisios* ـەوە، لە *Aphroditē* "Aphrodite") ◇ *adj* محرک جنسی، شهوتزا *n* مادەی محرک جنسی

**aphotic** = lightless; dark

**Aphrodite** *noun,* Greek *Aphroditē*

ئەفرۆدیت، ئافرۆدیت: خوای خۆشەویستی (لای یۆنانییەکان) و بەرامبەر بە ڤینوسی Venus رۆمییەکان ◇ آفرودیت

**aphtha** /'afθə/ *noun, pl.* aphthae /'afθiː/

(پزشکی) بۆقڕە، گۆڵە؟: برینێکی چکۆلە کە بە کۆمەڵ لە دەم یان لەسەر زمان پەیدا دەبێ (بنەڕەت: بە ڕێگای لاتین لە یۆنانییەوە، پێوەندی بە *haptein* ـەوە هەیە "دانان لەسەر

ئاور") ◌ برفک

**aphthous** *adjective*

بۆقژەگرتوو، تووش‌بوو بە بۆقژە (یان گوڵە؟) ◌ مبتلا به برفک

**aphyllous** *adjective,* also aphyllose

بێ‌گەڵا ◌ بی‌برگ

**apian** /'eɪpɪən/ *adjective*

مێشی، هەنگی، سەربە مێش ◌ وابسته به زنبور

**apiary** /'eɪpiəri, US -ieri/ *noun, pl.* apiaries

مێش‌ڕاگری، مێش‌ڕاگرتن، مێش‌داری، کەنووداری، مێشەوانی، هەنگ‌داری، بەخێوکردنی مێشەنگوین (apiarian *adj*: سەربە هەنگ‌داری یان مێش‌داری یان مێشەوانی؛ apiarist *n*) ◌ زنبورداری

**apical** /'eɪpɪk(ə)l, US 'ap-/ *adjective*

1 لووتکەیی، پۆپەیی، جێگرتوو لە لووتکە apex، لووتکەگیر 2 (دەنگ‌ناسی) سەرەزمانی، نووکەزمانی (وەک *th* apically *adv*) ◌ 1 اوجی، واقع در اوج 2 نوک‌زبانی

**apical meristem** *noun*

دابەشانی کۆتا، دابەشانی لووتکەیی یا پۆپەیی ◌ مریستم تارکی یا انتهایی

**apical dominance** *noun*

زاڵی کۆتا، زاڵی لووتکەیی یا پۆپەیی ◌ غالبیت تارکی یا انتهایی

**apices** = plural form of apex

**apiculture** /'eɪpɪkʌltʃə(r)/ *noun,* technical term for bee-keeping

مێش‌داری، مێشەوانی، کەنووداری، هەنگ‌داری، مێش‌ڕاگرتن ( apicultural /,eɪpɪ'kʌltʃərəl/ *adj*؛ apiculturist *n* ) ◌ زنبورداری

**apiece** /ə'pi:s/ *adverb*

هەریەک، هەرکام، دەنکی، دانەی، سەرو، individually: *The largest stones weigh over five tonnes -ce* ◌ دانه‌ای، هریک، هرکدام

**apish** /'eɪpɪʃ/ *adjective*

1 مەیموون‌ئاسا، شێوەمەیموون، مەیموونی 2 لاساکەرەوە 3 گەوجانە: *apish antics* ◌ 1 میمون‌شکل 2 مقلد 3 احمقانه

**apishly** /'eɪpɪʃli/ *adverb*

1 مەیموون‌ئاسا 2 گەوجانە ◌ 1 میمون‌مانند 2 (به طور) احمقانه

**apishness** /'eɪpɪʃnəs/ *noun*

مەیموون‌ئاسایی ◌ میمون‌مانند بودن

**apivorous** *adjective*

هەنگ‌خۆر، مێش‌خۆر ◌ زنبورخوار

**aplacental** *adjective*

بێ‌زامال، بێ‌ئاوەڵمناڵ ◌ بی‌جفت

**aplasia** /ə'pleɪzɪə/ *noun*

(پزشکی) گرفت یان کێشەی ئەندام یان شانەی سەبارەت بە هەڵدان یان بە باشی کارکردن function normally ◌ آپلاسیا

**aplastic** *adjective*

(پزشکی) تووش‌بوو بە ئەپلێزیا ◌ آپلاسیک

**aplenty** /ə'plenti/ *adjective, adverb*

زۆر، زەبەند، گەلێک، خەرواری، کۆمایی، دنیایی، بێ‌ئەژمار، پترلەپێویست، plentifully، extremely: *money aplenty for all their needs* ◌ فراوان، وافر، بسیار، یک عالم

**aplomb** /ə'plɒm, US ə'plɑ:m/ *ndoun*

1 لەخۆڕادیتن، خۆباوەڕی، باوەڕبەخۆیی، self-confidence، confidence، assurance: *with considerable/great/remarkable aplomb* 2 لەسەرەخۆیی، مەندی ◌ 1 اعتماد به نفس 2 خونسردی

**apnoea** /ap'ni:ə/ *noun,* US apnea

وەستانی کاتی هەناسە، ب.ت. لە خەودا، بێ‌هەناسەیی (بنەڕەت: لاتینی نوێ، لە *apnoia* یۆنانی، لە *apnous* "بێ‌هەناسە") ◌ اپنویا

**apo** *noun, pl.* apos

apolipoprotein = (لەگەڵ پیت یان پیت و ژمارە بەکاردێتێ) ◌ اپنوپا

**apo- (also ap-)** /'apəʊ/ *prefix*

پێشگر: دوور لە، جیا، جیاواز، جودا، نەلکاو، پێکەوەنەنووساو، دروست‌بوو، پێکهاتوو (لە): *apogamy*، *aphelion*، *apocrine*، *apoenzyme*، *apocarpous*، *apomorphine* (لە *apo* یۆنانی‌یەوە "from, away, quite, un-") ◌ پیشوند: دور از، جدا، متشکل از

**Apoc.** *abbreviation* 1 Apocalypse 2 Apocrypha

**apocalypse** /ə'pɒkəlɪps, US ə'pɑ:k-/ *noun*

1 تیاچوون، لەنێوچوون، فەوتان، پاکتاوبوون، لێک‌هەڵوەشان: *Civilization is on the brink of apocalypse* 2 دینساو 3 کارەسات، ماڵوێرانی: *an environmental apocalypse* ◌ 1 فنا، تباهی، نابودی 2 مکاشفه 3 فاجعه

**the Apocalypse** /ə'pɒkəlɪps, US ə'pɑ:k-/ *noun*

1 کۆتایی جیهان، ئاخر زەمان 2 (کتێبی پیرۆز) کتێبی دیناوی یوحەننا ◌ 1 پایان جهان، آخرالزمان 2 اپوکالیپس، کتاب مکاشفات یوحنا

**apocalyptic** /ə,pɒkə'lɪptɪk, US ə,pɑ:k-/ *adjective,* also -ocalyptical

1 وێرانکار، وێرانکەر، خاپوورکەر، ماڵوێرانکەر، کارەساتاوی: *an apocalyptic view of history* 2 لە شێوەی کۆتایی جیهان، *apocalyptic warnings of the end of society* ◊ 3 ئاخرزەمانی: *an apocalyptic scene* پێش‌گۆیانە، پێش‌بینی‌یانە (چارەنووسی جیهان)، دیناوی، prophetic ( apocaliptically

:/ɔˌpɒkəˈlɪptɪkli, US əˌpɑːk-/ *adv* بەشـێوەیەکی ویـرانکـار، ویـرانکەرانـە، ماڵویرانکەرانە، بەشێوەیەکی کارەساتاوی) ◌ 1 نابودکننـده، فاجعـه‌آمیـز 2 آخرالزمـانی 3 پیش‌گویانه، مکاشفه‌ای

**apocalyptism** *noun*, also apocalypticism
چـاوەڕوانی ئـاخرزەمـانی apocalyptic ◌ آپوکالیپتیسم

**apocalyptist** *noun*
نووسەری کتێبی دیناوی یوحەننا ◌ نویسندهٔ کتاب مکاشفات یوحنا

**apocarpous** /ˌapəˈkɑːpəs/ *adjective*
(ڕووەکناسی) خاوەنی نێرکەی جیا ( apocarpy *n*) ◌ دارای برچه‌ی جدا

**apochromatic** *adjective*
(دەربارەی لێنزەوە) خڕبوونەوەی ڕووناکی لە تیشکۆیێکی گۆیی‌دا، بەبێ‌لادانی ڕۆشنایی و ڕەنگی، هیچ لادانێکی گۆیی spherical و ڕەنگی نەبووە: aberration *an* apochromat ) *apochromatic lens* ◌ (apochromatism *n* ;/ˈapəkrəmat/ *n* آپوکروماتیک

**apocope** /əˈpɒkəpi, US əˈpɑːk-/ *noun*
(دەنگناسی) لابردن یان قرتاندنی یەک یان چەند دەنگ یان پیت لە کۆتایی وشەیەکدا (وەکوو *cuppa tea* کە دەبێتە *cup of tea* یان *sing* لە *singan* ئینگلیسی کۆن؛ apocopic *adj*) ◌ ترخیم

**Apocr.** *abbreviation* Apocrypha

**apocrine** /ˈapəkrʌm, -krɪn/ *adjective*
سەربەو ڕژێنانەی کە هێندێ سایتۆپلازم لە دەردانەکانیاندا ئازاد دەکەن، ب.ت. sweat gland ـەکان لە بنهەنگڵ و بەرگەدە ◌ آپوکرین

**Apocrypha** /əˈpɒkrɪfə, US əˈpɑːk-/ *noun*
ئێپاکریفا، ئاپۆکریفا (= کۆمەڵە پاشکۆ یان بەشە گومانلەسەرەکانی کتێبی پیرۆز، ئەو کتێبانەی سەربە پەیمانی کۆن Old Testament کە لە لایەن جوولەکەکانەوە وەکوو بەشێ لە نووسراوە پیرۆزەکانی عیبری پەسند ناکرێن) ◌ ابوکریفا، ملحقات (کتاب مقدس)

**apocryphal** /əˈpɒkrɪfl, US əˈpɑːk-/ *adjective*
1 جێی‌شک، گوماناوی، گومانبار، گومانلەسەر، ساختە، درۆ، ناڕاست، ناواقعی، false، spurious 2 سەربە ئێپاکریفا یان ئاپۆکریفا، ئاپۆکریفایی، شـێوەی Apocrypha دەدا ( apocryphally *adv*، apocryphalness *n*) ◌ 1 مـشکوک، مجعول، کاذب، دروغین 2 وابسته به ابوکریفا

**apod** *noun*
گیانلەبەری بێ‌پێ یان بێ‌پا ◌ جانور بی‌پا

**apodal** *adjective*, also apodous
بێ‌پێ، بێ‌پا، بێ‌لاق، بەبێ ئەندامێکی پاناسا یا شێوەپا footlike ◌ بی‌پا

**apodictic** /apəˈdɪktɪk/ *adjective*, also apodeictic /-ˈdʌɪktɪk/
مسۆگەر، بەڵگەنەویست، دیار ( apodictically *adv*) ◌ بدیهی، مسلم

**apodosis** /əˈpɒdəsɪs/ *noun*, *pl.* apodoses /-siːz/
1 ئەنجام، ناکام 2 (ڕێزمان) کلۆزی سەرەکی ڕستەیێکی مەرجی (بڕوانە protasis) ◌ 1 نتیجه 2 آپودوسیس

**apodous** /ˈapədəs/ *adjective*
(گیانەوەرناسی) بێ‌پێ یان خاوەنی تەنیا پێی بنەڕەتی ◌ آپودوس

**apoenzyme** *noun*
پێکهێنەری پرۆتێین کە لەگەڵ coenzyme هەوێنەیێکی تەواو پێکدێنێ یان هەوێنەی ناچالاک کە بەهۆی کۆئانزیمەوە چالاک دەبێ ◌ آپوانزیم

**apogamic** *adjective*, also apogamous
سەربە یان پێوەندی بە ئاپۆگامی‌یەوە هەیە ◌ آپوگاموس

**apogamy** *noun*
هەڵدان یان پەرەسەندنی sporophyteێ لە گامێتۆفایتێکەوە gametophyte بەبێ پیتاندن fertilization ◌ آپوگامی

**apogee** /ˈæpədʒiː/ *noun*
1 (ئەستێرەوانی) لووتکە، بۆیە، دووران، ترۆپک (بەرامبەری perigee) 2 لووتکە، ترۆپک، ئەوپەڕ، بەرزترین خاڵ، culmination: Aegean civilization reached its climax apogee in Crete ( apogeal، apogean، apogeic *adj*) ◌ 1 (نجوم) اوج 2 اوج

**apolipoprotein** *noun*
ئاپۆلیپۆپرۆتێین: پرۆتێینی کە لەگەڵ لیپیدێ تێکەڵ دەبێ تا لیپۆپرۆتێینی lipoprotein پێکبێنێ ◌ آپولیپوپروتئین

**apolar** *adjective*
(زۆرتر زیندەکیمیا) بێ‌جەمسەر ◌ آپولار

**apolitical** /ˌeɪpəˈlɪtɪkl/ *adjective*
ناڕامیاری، ناسیاسی، گرنگی سیاسی نەبێ (- itically *adv*) ◌ غیرسیاسی

**Apollinian** – Apollonian

**Apollo** *noun*, Latin *Apollin-*, *Apollo*, from Greek *Apollōn*
1 ئاپۆلۆ: خودای یۆنانی و ڕۆمی بۆ هەتاو، موسیقا، هەڵبەست و پێشزانی prophecy 2 (apollo, *pl.* apollos) جۆرێ پەپوولە، بە خاڵی سوور و ڕەشەوە، زۆرتر لە چیاکانی ئەورووپا دەبینرێ [*Parnassius apollo*] ◌ 1

آپولو 2 نوعی پروانه

**Apollonian** /ˌapəˈləʊnɪən/ *adjective*

1 (لە میسۆلۆژی یۆنانیدا) سەربە ئاپۆلۆ 2 سەربە لایەنە عەقڵی، خۆراگر و ڕێکوپێکەکانی سروشتی مرۆڤ (بڕوانە Dionysiac) ◌ وابسته به آپولو

**Apollyon** *noun*, Greek *Apollyōn*

ئاپۆلیۆن: فریشتەی چاڵی بێبن لە کتێبی Revelation دا ◌ آپولیون

**apologetic** /əˌpɒləˈdʒetɪk, US əˌpɑːl-/ *adjective*

1 لێبوردنخوازانە، وادیارە داوای لێبوردن بکا: *an apologetic letter for the delay* ◊ *an apologetic look* 2 پەشیمان، بەداخ، نارەحەت: *apologetic for the oversight* ◌ 1 پوزش‌طلبانه، پوزش‌آمیز 2 متأسف

**apologetically** /əˌpɒləˈdʒetɪkli, US əˌpɑːl-/ *adverb*

لێبوردنخوازانە، بە داوای لێبوردنەوە ◌ از روی پوزش‌طلبی

**apologetics** *noun, pl.*

هونەر یان پرەکتیسی بەرگری کردن لە ئایدیا و بیروباوەڕ (ب.ت. ئەوانەی کریستانیەت) بە بەڵگەهێنانەوەی لۆژیکی ◌ احتجاج دینی

**apologia** /ˌæpəˈləʊdʒiə, US -ˈloʊ-/ *noun, pl.* apologias

بەرگرینامە، پارێزنامە ◌ دفاعیه

**apologist** /əˈpɒlədʒɪst, US əˈpɑːl-/ *noun*

پارێزەر، بەرگریوان، بەرەڤانکار (بە بەڵگەهێنانەوەی لۆژیکی) ◌ مدافع

**apologue** /ˈapəlɒg/ *noun*

ئەپۆلۆگ، داستان یان چیرۆکی ئاکاری (apologual *adv*) ◌ آپولوگ

**apology** /əˈpɒlədʒi, US əˈpɑːl-/ *noun, pl.* apologies

1 داوای لێبوردن، لێبوردنخوازی، عوزرمایی، عوزرخوازی: *to offer/make/demand/accept an apology* ◊ *We received a letter of apology* 2 بەرگری، بەرەڤانی، defense ◌ 1 پوزش، عذرخواهی 2 دفاع

**apolune** /ˈapə(ʊ)luːn/ *noun*

دوورەمانگ، شوێنێ بۆ کەشتی ئاسمانی لەسەر سوورگەی مانگ، دوورترین جێگایە لە مانگەوە (بەرامبەری perilune) ◌ آپولیون

**apomict** /ˈapəmɪkt/ *adjective*

ناتێکەڵایەتییانە، سەربە ناتێکەڵایەتی، ڕووەکێ کە لەو ڕێگاوە دەڕوێ ◌ وابسته به ناآمیزی

**apomixis** /ˌapəˈmɪksɪs/ *noun, pl.* apomixes

ناتێکەڵایەتی، زۆربوون یا زاوزێی بێجووتبوون لە گیاکاندا (بڕوانە amphimixis، apomictic *adj*، apomictically *adv*) ◌ ناآمیزی

**apomorphine** *noun*, also apomorphin

ئاپۆمۆرفین: بەرهەمێکی مۆرفینی کریستاڵی $C_{17}H_{17}NO_2$ ◌ آپومورفین

**aponeurosis** /ˌapənjʊˈrəʊsɪs/ *noun, pl.* aponeuroses /-siːz/

(توێکاری) پەردەماسوولکە، پانەژێ ◌ غشای عضلی

**aponeurotic** *adjective*

پەردەماسوولکەیی، سەربە پانەژێ ◌ وابسته به غشای عضلی

**apophathic** /ˌapəˈfatɪk/ *adjective*

(یەزدانناسی، لەباری زانستی خوداوە) بە ڕێگای نکوڵییەوە بە دەسهاتووە (دژی cataphatic) ◌ آپوفاتیک

**apophony** (*pl.* nies) = ablaut (apophonic *adj*)

**apophthegm** /ˈapəθem/ *noun*, US apothegm

پەند، فەرموودە، وتەی پوخت، قسەی نەستەق، ماکیم (apophthegmatic /-θegˈmatɪk/ *adj*) ◌ گفته‌ی مشهور

**apophyge** *noun*

چەماوییێکی ڕووچاڵ concave کە قەد یا پایەی shaft ستوونێ بە بنکەکەی base یا سەرکوڵەکەی capital دەبەستێتەوە ◌ گیلویی پاستون

**apophyllite** /əˈpɒfɪlʌɪt/ *noun*

ئاپۆفیلایت، ئاپۆفیلیت: کانێکی سپی کە لە سیلیکاتی $KCa_4Si_8O_{20}(F, OH).8H_{2}O$ ئاودار و فلۆرایدی کالسیۆم و پوتاسیۆم پێکهاتووە، سەربە zeolite ◌ آپوفیلیت

**apophyllous** *adjective*

جیاقاپووچکە، قاپووچکەجیاواز ◌ جداکاس‌برگ

**apophyseal** *adjective*

سەربە یان پێوەندی بە apophysis ـەوە هەیە ◌ زایده‌ای

**apophysis** /əˈpɒfɪsɪs/ *noun, pl.* apophyses

(زۆرتر گیانەوەرناسی و توێکاری) چوکڵە، قەڵبە، زیکە، زەقایی، قوتکە، زیادە، دەرپەڕیو، قوتایی، بەشێکی دەرپەڕیوی زیندەوەرێ ◌ زایده

**apoplectic** /ˌæpəˈplektɪk/ *adjective, noun*, also apoplectical

1 *adj* (سەربە) وێستانی مێشک، مێشکوێستاو 2 تووشبوو بە وێستانی مێشک 3 زووتووڕە، سووڕەوەبوو، فیشەکی، ئاڵەتی، جینگزی، بەردبەباکەر *n* کەسێکی وا (apoplectically *adv*) ◌ 1 *adj* سکته‌ای 2 مبتلا به سکته‌ی مغزی 3 آتشی، برافروخته *n* آدم مبتلا به سکته‌ی مغزی

**apoplexy** /ˈæpəpleksi/ *noun*

1 مێشکوێستان، مێشکەکپێ، وێستانی مێشک 2

(نافەرمی) قسەبۆنەکران لەبەر رقھەستان ◌ 1 سکتەی مغزی 2 آپوپلکسی

**apoprotein** /ˌapəˈprəʊtiːn/ *noun*
(زیندەکیمیا) ئاپۆپرۆتئین: پرۆتئینێ کە پێکەوە لەگەڵ کۆمەڵی پرۆستێتیک prosthetic group گەردێکی تایبەتی زیندەکیمیاییانە پێکدێنێ، وەک هۆرمۆن یان هەوێنەیێ ◌ آپوپروتئین

**apoptosis** /ˌapə(p)ˈtəʊsɪs/ *noun*
مەرگی خانە(یی): مردنی خانەکان کە وەکوو بەشێکی ئاسایی پەرەسەندنی زیندەوەر یان ئۆرگانیزمێ روودەدا ◌ آپوپتوز، آپوپتوسیس

**apoptotic** /-ˈtɒtɪk/ *adjective*
سەربە ئاپۆتۆسیس ◌ وابسته به آپوپتوسیس

**aport** *adverb, adjective*
1 لەسەر یان بەرەو تەنیشتی چەپی کەشتی 2 بەرەو بەندەر، رووڵە بەندەر ◌ 1 روی یا در جهت جانب چپ کشتی 2 به سوی بندر

**aposematic** /ˌapə(ʊ)sɪˈmatɪk/ *adjective*
(گیانەوەرناسی) ئاگادارکەرەوە، جیانیشانە، وریاییدەر (ئاماژە بە رەنگ یا نیشانەیێ بۆ وریاکردنەوە یان دوورخستنەوەی راوچی): *aposematic coloration in butterflies* (aposematism *n* ;aposematically *adv*) بنەرەت: لە -apo + *sēma* یۆنانی "نیشانە" + -atic) ◌ هشداردهنده

**aposematic behaviour** *noun*
هەڵسوکەوتی ئاگادارکەرەوە، رەفتار یان رەوتاری جیانیشانە، هەڵسوکەوتی وریاییدەر ◌ رفتار هشداردهنده

**aposematic colour** *noun*
رەنگی ئاگادارکەرەوە یان وریاییدەر ◌ رنگ هشداردهنده

**aposiopesis** /ˌapə(ʊ)ˌsʌɪəˈpiːsɪs/ *noun, pl.* aposiopeses /-siːz/
برینی کوتوپڕی قسە (یان رستە، وەک لە " his behavior was-but I blush to mention that" (aposiopetic *adj*. ◌ آپوسیوپسیس

**apospory** *noun*
بێسپۆری، جیاسپۆری، ئاپۆسپۆری: پەرەسەندنی رووەکی گامێتی gametophyte لە سپۆرۆفیتێکەوە بەبێ دابەشبوونی کەمبوونەوەیی meiosis؛ بەرهەمهاتنی گامێتۆفیتەکان یەکراست لە خانە دیپلۆئیدەکانی diploid cells سپۆرۆفیتەکان بەبێ پێکهاتنی سپۆر (وەک لە هێندێ فیرن یان moss ;aposporic *adj* (aposporous *adj* ◌ آپوسپوری، بی‌هاگی

**apostasy** /əˈpɒstəsi, US əˈpɑːs-/ *noun, pl.* apostasies
هەڵگەڕانەوە، بادانەوە، دینبەردان، دیندری ◌ ارتداد، ترک عقیده

**apostate** /əˈpɒsteɪt, US əˈpɑːs-/ *noun, adjective*
(کەسێکی) هەڵگەڕاو، دیندڕ (apostatical *adj*; apostatically *adv*) ◌ مرتد

**apostates** *noun, pl.*
هەڵگەڕاوان ◌ مارقان، مرتدان

**a posteriori** /ˌeɪ ˌpɒsteriˈɔːraɪ, US ˌpɑːs-/ *adjective, adverb*
(لاتین) بەڵگەهێنانەوەیی، پاشئەزموونی، پاشتاقیگەری، پاشینی، ئەزموونی، ئێستێریۆرای، پێزانین لە رێگای هۆکردەوە بە هۆ، هۆکرددۆزی، لێکدانەوەی هۆکرد (بڕوانە a priori، بنەرەت: لاتین "لەوەوە کە پاشتر دێ") ◌ استدلالی، پساتجربی، انی، تجربی، استقرایی

**apostil** /əˈpɑːstɪl/ *noun*, also apostille
پەراوێز ◌ حاشیه

**apostle** /əˈpɒsl, US əˈpɑːsl/ *noun*
1 حەواری 2 پێشەوا، رێبەر، مامۆستا، نێردراو، نێردە، راگەیێنەر 3 (Apostle) حەوارییەکان (هەر یەک لەو دوازدە پیاو کە لە لایەن مەسیحەوە هەڵبژێردران تاکوو لەبارەی خۆی و ئامۆژگارییەکانی، بە خەڵک راگەیێنن) ◌ 1 حواری 2 رهبر، رسول، مبلغ 3 (با A) حواریون

**Apostle's Creed** *noun*
باوەڕنامەی حەوارییەکان یان یارانی مەسیح ◌ اعتقادنامەی حواریون

**apostlebird** *noun*
جۆرێ باڵندەی ئەوسترالیایی مێگەلژی، بە باڵوپەڕی بۆر، قاوەیی و رەشەوە [ *Struthidea cinerea* ] ◌ نوعی پرنده

**apostleship** /əˈpɒslʃɪp/ *noun*
پەیامبەری، پەیامگەیێنی ◌ رسالت

**apostolate** /əˈpɒstəleɪt/ *noun*
1 پەیامبەری، پەیامگەیێنی 2 کۆمەڵێ لە حەوارییەکان، کۆمەڵ یان گرووپی حەوارییەکان ◌ 1 رسالت 2 گروه حواریون

**apostolic** /ˌæpəˈstɒlɪk, US -ˈstɑːlɪk/ *adjective*, also apostolical
1 سەربە حەوارییەکان: *apostolic writings* 2 سەربە پاپ: *The Pope appointed six apostolic administrators* (apostolically *adv*; apostolicism *n*; apostolicity *n*) ◌ وابسته به حواریون یا پاپ

**apostolic deligate** *noun*
نوێنەرایەتی رامیاری یان سیاسی پاپ ◌ نمایندگی سیاسی پاپ

**Apostolic Father** *noun*
قەشەی کلێسەی سەدەکانی یەکەم و دووهەمی زایینی ◌ پدر روحانی

**apostolic succession** *noun*
گرتنی دەسەڵاتی ئایینی بەشێوەیەکی یەکلەدوای یەک لە ئێیاسێلێکەوە بۆ پابەکان

(یان گەورەقەشەکان) ۞ اپوستولیک ساکسیون
**apostrophe¹** /ə'pɒstrəfi, US ə'pɑːs-/ *noun*
کرتین، بۆرۆکە، ئێپاستروف (' یان ') ۞ آپوستروف
**apostrophe²** /ə'pɒstrəfi, US ə'pɑːs-/ *noun*
بادانەوە، بانگ ۞ خطاب
**apothecaries' weight** *noun*, also apothecaries' measure
(مێژوویی) سەنگی دەرمانی: سیستمی یەکەکانی جاران کە بۆ کێشانی دەرمانەکان بەکاردێنرا، دەرمانکێش ۞ آپوتوکاریس ویت
**apothecary** /ə'pɒθəkəri, US ə'pɑːθəkeri/ *noun, pl.* apothecaries
(کۆن) 1 دەرمانساز، دەرمانگەرەوە، دەرمانفرۆش (بۆ مەبەستی پزشکی)، druggist، pharmacist 2 دەرمانخانە، دەواخانە، pharmacy، drugstore ۞ 1 دواساز، دوافروش 2 داروخانە
**apothecial** *adjective*
سەربە ئاپۆتیسیۆم ۞ وابستە بە آپوتسیوم
**apothecium** *noun, pl.* apothecia
بەرگی بەر و میوەی هێندێ کرێژەبەرد و کەڕوو و کارگ ۞ آپوتسیوم
**apothegm** = US spelling of apophthegm
**apothem** /'apəθem/ *noun*
(ئەندازە) بەرزایی ۞ ارتفاع
**apotheosis** /əˌpɒθi'əʊsɪs, US əˌpɑːθi'oʊ-/ *noun, pl.* apotheoses /-siːz/
1 پەرەسەندنی بەرز، سەرترین ئاستی پەرەسەندن 2 نموونە، سەرنموونە 3 کردنەخودا، بەخوداکردن، بەخودابوون، هەڵکێشان تا پلەی خودایەتی، بردنەسەرەوە تا پایەی خودایەتی، بوونەخودا 4 پیاهەڵوتن (تا پلەی خودایەتی) ۞ 1 توسعەی عالی 2 مظهر، نمونەی کامل 3 تألیە 4 تمجید
**apotropaic** *adjective*
روو لە خراپە وەردەگێڕیّ (یان خۆی لێ لادەدا): (apotropaically *adv*) *an apotropaic ritual* ۞ قابل استیناف
**app.** *abbreviation* 1 apparatus 2 apparent 3 appendix 4 applied 5 appointed 6 approved 7 approximate 8 appliance
**Appalachian** *noun, adjective*
*n* کەسێکی سپیپێستی رەسەن یان دانیشتووی ناوچە شاخاوییەکەی ئاپالاچیا یان ئاپالاشیا (ناوچەیێ لە رۆژهەلاتی ئەمریکا، لە دەڤەری چیاکانی ئەپالاچیای باشووری، ب.ت. باکووری رۆژهەلاتی Alabama، باکووری رۆژاوای Georgia، باکووری رۆژاوای Carolinaی باشووری، رۆژهەلاتی Tennessee، رۆژاوای Virginia، رۆژهەلاتی Kentucky، قیرجیانیای رۆژاوا و باشووری رۆژاوای Pennsylvania دەگرێتەوە) *adj* سەربە چیاکانی ئەپالاچیا؛ سەربە ناوچەی ئەپالاچیا یان دانیشتووانی ۞ آپالاچیان
**Appalachian dulcimer** = dulcimer2
**Appalachian Mountains** *noun, pl.*
چیاکانی ئاپالاچیا: زنجیرە چیای رۆژهەلاتی ئەمریکای باکووری، بەرزترین چیا Mt. Mitchell, 6684 ft. (2037 m) ۞ کوههای آپالاچیان
**Appalachian tea** *noun*
چایی ئاپالاچیان: گەڵای دوو جۆر گیا (Ilex glabra و Ilex vomitoria)، لە رۆژهەلاتی ئەمریکا لە جیاتی چایییە ۞ چای آپالاچیان
**appalled** /ə'pɔːld/ *adjective*
1 ئێپۆڵد، ترساو، تۆقیو، زراوچوو 2 بێزراو، بێزار ۞ 1 متوحش 2 متنفر
**appalling** /ə'pɔːlɪŋ/ *adjective*
1 ترسێنەر، ترسناک: *The prisoners were living in appalling conditions* 2 دڵتەزێن، جەرگبڕ، جێیداخ، زۆر شپرزە، یەکجار خراپ: *The bus service is appalling now* ۞ 1 هولناک 2 تکان‌دهنده، بسیار بد
**appallingly** /ə'pɔːlɪŋli/ *adverb*
1 ترسێنەرانە، تۆقێنەرانە 2 زۆر خراپ: *The essay was appallingly written* ۞ 1 بە طور هولناکی 2 بسیار بد
**Appaloosa** /ˌapə'luːsə/ *noun, pl.* Appaloosas
ئەسپێ لە نژادێکی ئەمریکای باکووری، بە خاڵی رەشەوە (بنەرەت: لە *Opelousas* لە Louisiana یان *Palouse* رووباریّ لە Idaho) ۞ آپالوسا
**appanage** /'æpənɪdʒ/ *noun*, also apanage
1 بەشی پاتشایی، کەلەبەر یان فیۆدی (هەمیشەیی) شازادەکان (appanages) 2 پێویستییەکان، پێداویستییەکان 3 کۆمەڵە پاشکۆی سروشتی یان پێویست ۞ 1 تیول شاهزادەها 2 (در جمع) لازمە 3 اپینج
**apparat** /ˌapə'rɑːt/ *noun*
(زۆرتر مێژوویی) شێوازێکی بەڕێوەبەرایەتی پارتی کۆمۆنیست، دەزگا و سیستم یان رێکخراوەی پێکهاتەی هێزێ: *the party apparat* ۞ اپارات
**apparatchik** /ˌæpə'rɑːtʃɪk/ *noun, pl.* -aratchiks or apparatchiki /-kiː/
1 کاربەدەستێ لە رێکخراوەیەکی سیاسی گەورە (لە رووسییەوە) 2 (بتر مێژوویی) ئەندامی apparatی پارتییێکی کۆمۆنیست ۞ اپاراتچیک
**apparatus** /ˌæpə'reɪtəs, US -'rætəs/ *noun*
1 دەزگا، کەرەسە، ئامێر، رەخت، ئامراز، کەلوپەل: *a piece of laboratory apparatus*

2 داموده‌زگا، داووده‌زگا: *For many years, the country had been buried under the power of the apparatus of the regime* ◊ *the state apparatus* 3 (تویکاری) ده‌زگا: *the sensory apparatus* ۞ 1 دستگاه، ابزار، لوازم 2 تشکیلات 3 دستگاه

**apparel** /ə'pærəl/ *noun*
جل‌وبه‌رگ، جامه، به‌رگ، شمه‌ک، کراس ۞ جامه، لباس

**apparent** /ə'pærənt/ *adjective*
1 دیار، ئاشکرا، به‌رچاو، راشکاو، خۆیا، کفش: *Their devotion was apparent* ◊ *reasons that are readily apparent* ◊ *I was a bit depressed by our apparent lack of progress* 2 رواڵه‌تی، رووکه‌شی ( apparentness *n*) ۞ 1 پدیدار، آشکار، واضح 2 ظاهری، صوری

**apparent diameter** *noun*
تیره‌ی رووکه‌شی یان رواڵه‌تی ۞ قطر ظاهری

**apparent horizon** *noun*
ئاسۆی رواڵه‌تی یان دیار، ئاسۆی بینراو ۞ افق ظاهری

**apparently** /ə'pærəntli/ *adverb*
به‌رواڵه‌ت، له‌و جۆره‌ی که‌وا دیاره، وادیاره، باقڵ، به‌ ئه‌قڵ، گوایه، ویده‌چێ: *Apparently they are getting divorced soon* ◊ *I thought she had retired, but apparently she hasn't* ۞ ظاهراً، گویا

**apparent magnitude** *noun*
(ئه‌ستێره‌وانی) توانایی رووکه‌شی یان رواڵه‌تی ۞ قدر ظاهری

**apparent motion** *noun*
جووڵه‌ی رووکه‌شی یان رواڵه‌تی ۞ حرکت ظاهری

**apparent time** *noun*
کاتی رووکه‌شی یان رواڵه‌تی ۞ زمان ظاهری

**apparition** /ˌæpə'rɪʃn/ *noun*
1 ده‌رکه‌وتن، په‌یدابوون، هاتنه‌روو، سه‌رهه‌ڵدان (سه‌یر یان چاوه‌روان‌نه‌کراو) 2 خێو، تارمایی، رۆح، تاپۆ ۞ 1 تجسم، ظهور 2 شبح

**appeal** /ə'pi:l/ *noun*
1 داخوازی، خۆسته‌ک، داوا 2 پارانه‌وه، لاڵانه‌وه، لاڤاهی، په‌نابردنه‌به‌ر، داوێن‌گیری، هانابردنه‌به‌ر 3 پیاچوونه‌وه، راستکردنه‌وه: *an appeal court/judge* 4 دڵـــرفێنی، سه‌رنج‌راکێشی، راکێشان ۞ 1 درخواست، تقاضا 2 التماس، توسل 3 استیناف 4 کشش، جذبه

**appealable** *adjective*
شیاوی پیاچوونه‌وه، له‌راستکردنه‌وه‌هاتوو ۞ قابل استیناف

**appealer** *noun*
(ماف) پیاچوونه‌وه‌خواز ۞ پژوهش‌خواه

**appealing** /ə'pi:lɪŋ/ *adjective*
1 خۆش، سه‌رنج‌راکێش، باڵکێش: *an appealing design* 2 داوێن‌گرانه، داوێن‌گیرانه، به‌ پارانه‌وه: *She gave him a soft appealing look that would have melted solid ice* (appealingly /ə'pi:lɪŋ/ *adv*: 1 به‌شێوه‌یه‌کی خۆش یان سه‌رنج‌راکێش، سه‌رنج‌راکێشانه 2 به‌پارانه‌وه) ۞ 1 جذاب، گیرا 2 ملتمسانه

**appearance** /ə'pɪərəns. US ə'pɪr-/ *noun*
1 ده‌رکه‌وتن، ده‌رکه‌وت، هاتنه‌روو، په‌یدابوون، دیــار(که‌وتن)ی، سه‌رهه‌ڵدان: *the physical/outward/external appearance of something* 2 هاتنه‌نێو، گه‌یشتن 3 رواڵه‌ت، رووکه‌ش، نموود، دیمه‌ن، سه‌روسه‌کوت، شێوه‌ی ده‌ره‌وه، رووکار، پێش، روخسار، روو 4 پیشاندان، رانان 5 هاتن، ئاماده‌بوون ۞ 1 پیدایش، ظهور 2 ورود 3 ظاهر، نما، جلوه، سر و وضع 4 نمایش 5 حضور

**appeasable** *adjective*, also appellable
شیاوی دامرکاندن، له‌ دامرکان دێ ۞ قابل تسکین

**appeasement** *noun*
1 دامرکاندن، دڵدانه‌وه، ئارام‌کردنه‌وه، نیشاندنه‌وه، هێورکردنه‌وه، ژێرکردنه‌وه، رازی‌کردن، قایل‌کردن 2 رێک‌که‌وتن، سازان، بۆش‌کردن ۞ 1 تسکین، تسلی 2 سازش

**appellant** /ə'pelənt/ *noun, adjective*
*n* پیاچوونه‌وه‌خواز *adj* پیاچوونه‌وه‌یی، راستکردنه‌وه‌یی: *an appellant court* ۞ *n* پژوهش‌خواه *adj* استینافی

**appellant court** /ə'pelət kɔ:t, US kɔ:rt/ *noun*
دادگای پیاچوونه‌وه ۞ دادگاه استیناف

**appellation** /ˌæpə'leɪʃn/ *noun*
ناو، سه‌رناو، لاناو، ناوی گشتی، ناونان ۞ اسم، لقب، عنوان، تسمیه

**appellative** /ə'pelətɪv/ *noun*
ناو، نێو، سه‌رناو، لاناو، ناوی گشتی ۞ اسم، لقب، اسم عام

**appellee** /ˌapə'li:, US ˌəpɛ'li:/ *noun*
(ماف) داواله‌سه‌ر له‌ دادگای پیاچوونه‌وه‌دا ۞ پژوهش‌خوانده

**appendage** /ə'pendɪdʒ/ *noun*
1 پاشکۆ، لکاند، پاڵخسته، سه‌رخسته 2 زیادی، زیاده 3 (زینده‌ناسی) ئه‌ندام یان به‌شێکی پاشکۆ یان زیادی ۞ 1 ضمیمه، پیوست 2 زائده 3 عضو یا جزء ضمیمه یا اضافی

**appendant** /ə'penənt/ *adjective, noun*, also appendent
*adj* پێوه‌به‌ند، دیبه‌ند، سه‌رخسته، پاشکۆ *n* که‌سێکی دواکه‌وته، که‌سێکی به‌دواداچوو ۞ *adj* وابسته، ضمیمه *n* شخص تابع

**appendectomy** /ˌæpenˈdektəmi/ *noun*, also appendicetomy
پەلەریخۆلەبری، پەلەریخۆلەهەلکێشی، دەرکێشان یان هەلکێشانی پەلەریخۆلە ۞ آپاندیس برداری

**appendicitis** /əˌpendəˈsaɪtɪs/ *noun*
پەلەریخۆلە ئاوسان، ئاوسانی پەلەریخۆلە، پەلەریخۆلەئاوسێ، هەوکردنی پەلەریخۆلە ۞ آپاندیسیت

**appendicular** /ˌap(ə)nˈdɪkjʊlə/ *adjective*
پەلەریخۆلەیی، سەربە پەلەریخۆلە ۞ وابستە بە آپاندیس

**appendix** /əˈpendɪks/ *noun*, appendices /-dɪsiːz/
1 سەرخستە، پاشکۆ، پالخستە، کلک، لکاند: *Full details are given in Appendix* 2 کورت، پوخت 3 (تویکاری) پەلەریخۆلە، vermiform appendix ۞ 1 پیوست، ذیل، پی‌افزود 2 موجز 3 آپاندیس

**appestat** /ˈapɪstat/ *noun*
(کارئەندامناسی) ئەپیستات (ناوچەی هیپۆتالاموس کە لەوە دەچێ کۆنترۆلی ئیشتیا appetiteی بە دەس بێ) ۞ اپستات

**appetence** *noun*, also appetency /ˈapɪt(ə)nsi/, *pl.* appetencies
1 ویست، بێزوو، مەگیرانی، مەگیز، تاسە، مەیل، ئیشتیا، ئارەزوو، هۆگری، بەپەرۆشی 2 هەوەس ۞ 1 میل شدید، تمایل 2 شهوت

**appetent** /ˈapətənt/ *adjective*
تامەزرۆ، بەپەرۆش، بەتەما، بەتاسە، ئارەزوومەند ۞ مشتاق

**appetite** /ˈæpɪtaɪt/ *noun*
1 ئیشتیا، دلبردن، ئارەزوو 2 مەیل، ویست، حەز، ئارەزوو، بێزوو، مەگیز ۞ 1 اشتها 2 میل. شهوت، رغبت

**appetizer** /ˈæpɪtaɪzə(r)/ *noun*
مەزە، بەرخۆراک، ئیشتیاکەرەوە، دلبزۆک ۞ اشتهاآور

**appetizing** /ˈæpɪtaɪzɪŋ/ *adjective*
ئیشتیاکەرەوە، دلبزۆک، ئارەزووهێن (appetizingly /ˈæpɪtaɪzɪŋli/ *adv*: بەشێوەیەکی ئیشتیاکەرەوە، دلبزۆکانە) ۞ اشتهاآور

**Appian way** *noun*
ریگای بەردرێژی کۆنی نێوان رۆم تا Brundisium (ئێستا Brindisi) لە 312 پێش زایین لە لایەن Appius Claudius Caecus دەستی پێ کرا، دەوروبەری 350 مایل یان 565 کیلۆمیتر درێژە) ۞ جادەی آپین

**applause** /əˈplɔːz/ *noun*
1 چەپلەرێزان، چەپلەلێدان، چەپک‌لێدان 2 پەسن‌دان، پیاهەلوتن ۞ 1 کف زدن 2 تشویق

**apple** /ˈæpl/ *noun*
1 سێف، سێو 2 داری سێو [توخم *Malus*] 3 بۆ ناوی میوە ناپێوەندیدارە هاوشێوەکان بەکاردێتێ، ب.ن. appley، custard apple (*adj*: بنەرەت: *æppel* ئینگلیسی کۆن، بنەرەت ئەلمانی) ۞ 1 سیب 2 درخت سیب

**applecart** *noun*, upset the applecart
1 تێ‌ریان، گووتێ‌کردن، خراپ‌کردن، (هەموو شتێ) تێکدان، شێواندن 2 داشقە (دەس‌فرۆشی) ۞ 1 افتضاح (کردن) 2 چهارچرخه

**applejack** /ˈæpldʒæk/ *noun*
(لە ئەمریکا) ئەپلیجەک (خواردنەوەیەکی ئەلکۆلی بەهێزە کە لە ciderی ترشاو دروست‌کراوە) ۞ اپلجک

**apple-pie** *adjective*, in apple-pie order
1 (apple pie) پای سێو، ئەپل پای (لە شیرینی‌سازیدا) 2 تەواو، زۆرباش، دەق، ریک‌وپێک، *everything*: perfect, excellent *was in apple-pie order* ۞ 1 اپل پای 2 کامل، عالی، مرتب

**appliance** /əˈplaɪəns/ *noun*
1 دەزگا، ئامێر، کەرەسە، ئامراز، کەل‌وپەل، هەجەت 2 بەکارهێنان، پیادەکردن، خستنەکار، کاربەندی 3 ماشێنی ئاگرکوژاندنەوە (applianced *adj*) ۞ 1 وسیله، ابزار، آلت، اسباب 2 استعمال 3 ماشین آتش‌نشانی

**applicability** /əˌplɪkəˈbɪləti, US ˌæplɪk-/ *noun*
1 کارپێکراوی، جێبەجێ‌کراوی، بەکارهێنراوی، ئەکرێیی، پیادەکراوی 2 گونجاوی، بەجێ‌بوون، دروست‌بوون، لێوەشاوی ۞ 1 قابلیت اجرا، اطلاق‌پذیری، اعمال‌پذیری 2 مناسب بودن

**applicable** /əˈplɪkəbl, US ˈæplɪkəbl/ *adjective*
1 کارپێکراو، جێبەجێ‌کراو، ئەکرێ، بەکارهێنراو، پیادەکراو 2 گونجاو، بەجێ، دروست، لەبار، لێوەشاو: *statutes applicable to the case* 3 پێوەندیدار ۞ 1 قابل اجرا، اطلاق‌پذیر، اعمال‌پذیر 2 مناسب 3 مربوط

**applicant** /ˈæplɪkənt/ *noun*
خوازیار، داواکار، داخواز ۞ متقاضی، داوطلب

**application** /ˌæplɪˈkeɪʃn/ *noun*
1 داخوازی(نامە): *a planning/passport application* 2 بەکارهێنان، پیادەکردن، کارپێکردن، جێبەجێ‌کردن: *the application of new technology to teaching* 3 بەهەرەلێوەرگرتن، کەلک(لێ)وەرگرتن، بەکارهێنان، خستنەکار 4 هەول، کاری سەخت، حەول، خەبات، تێکۆشان 5 سەرنج‌پێدان، لێوردبوونەوە ۞ 1 درخواست، تقاضانامه 2

کاربرد، اعمال، اجرا 3 بهره‌گیری، استعمال 4 کوشش، سعی 5 توجه، دقت

**application form** *noun*

داخوازی‌نامه، فۆڕمی داخوازی ۞ برگ درخواست

**applicative** /'æpləekeıtıv/ *adjective*, also applicatory /'æplıekeıtɔrı/

کردارەکی، شیاوی جێبەجێبوون، کارپێکراو ۞ عملی، قابل اجرا

**applicator** /'æplıkeıtə(r)/ *noun*

1 ئامێر، کەرەسە، دەزگا 2 ئەپلیکاتۆر، دلۆپێنە(ر) ۞ 1 وسیله 2 آپلیکاتور

**applied** /ɔ'plaıd/ *adjective*

ناتیۆریک، نابیردۆزی، کردارەکی، کارپێکراو، کارەکی، کردەنی، کارپێکەرانە، بەکارهێنەرانە ۞ عملی، کاربردی

**applied linguistics** *noun*

زمانەوانی کرداری یان کارپێکەرانە: لێکۆڵینەوەی زمان و زمانەوانی دەربارەی پرس و دۆزە کرداری‌یەکان، وەک فەرهەنگ‌نووسی lexicography، وەرگێڕان translation، خەسارناسی ئاخاوتن speech pathology و هتد. زمانەوانی کرداری زانیاری لە (بوارەکانی) کۆمەڵناسی، دەروونناسی، مرۆڤناسی و تیۆری زانیاری و هەروەها لە زمانەوانی بەکاردێنێ بە مەبەستی پەرەپێدانی نموونە و مودێلە تیۆریکەکانی زمان و بەکارهێنانی زمان و پاشان ئەم زانیاری و تیۆری‌یانە لە بوار و مەڵبەندە کرداری‌یەکانی وەک دارشتنی وانەنامە syllabus، پلاندانانی زمان language planning، وتارتیماری speech therapy و هتد دەخاتەگەڕ ۞ زبان‌شناسی کاربردی

**applied mathematics** *noun*

بیرکاری کرداری یان کارپێکەرانە ۞ ریاضیات کاربردی

**applied science** *noun*

زانستی کرداری، زانستی کارپێکردن ۞ علم کاربردی

**appliqué** /ə'pli:keı, US ˌæplə'keı/ *noun*

لەتەدروو(یی)، تیکەدۆزی، کوتەدرویی، دوورینی تیکە یان لەتەپارچە و دانەدەم یەکتر ۞ تکه‌دوزی

**appliquéd** *adjective*

لەتەڕیز، تیکەدۆزی‌کراو، کوتەڕیز، لەتەدرواو ۞ تکه‌دوزی‌شده

**appointed** *adjective*

دیاری‌کراو، دانراو ۞ تعیین‌شده، انتصابی، گماشته

**appointee** /ɔˌpɔın'ti:/ *noun*

دیاری‌کراو، دانراو، دامەزراو ۞ منصوب‌شده

**appointive** *adjective*

دانراو، دیاری‌کراو: *an appointive office* ۞ انتخابی، انتصابی

**appointment** /ə'pɔıntmənt/ *noun*

1 بڕیار (دانانی کاتێ بۆ یەکتر دیتن) 2 پۆست، پلەوپایە 3 کار، ئیش 4 دانان، دیاری‌کردن، هەڵبژاردن، دامەزراندن، خستەکار 5 (appointments) کەل‌وپەلی نێومال، شمەکی ناومال ۞ 1 قرار 2 مقام 3 شغل 4 انتصاب، گمارش، تعیین 5 (در جمع) مبلمان

**apportionment** *noun*

1 دابەش‌کردن، بەش‌کردن، (دا)بەشاندن 2 تایبەتی‌دان، تەرخان‌دان 3 دیاری‌کردنی بەش ۞ 1 تقسیم، سهمیه‌بندی 2 تخصیص 3 تعیین حصه

**apposite** /'æpəzıt/ *adjective*

گونجاو، بەجێ، پەسند، بەڕێ‌وجێ، لەبار، بەوەختی خۆی: *Her* ◊ *apposite remarks remarks are extremely -site to the present discussion* ۞ مناسب، درخور، بجا، به‌موقع

**appositely** /'æpəzıtli/ *adverb*

گونجاوانە، بە شێوەیێکی گونجاو ۞ به طور مناسب

**appositeness** /'æpəzıtnəs *noun*

گونجاوی، بەجێبوون، لەباری ۞ مناسب بودن

**apposition** /ˌæpə'zıʃn/ *noun*

1 لکاندن، خستنەسەر، پاڵخستن 2 (ڕێزمان) ئەپۆزیشن، لەباتی، بریتی، بریتە ۞ 1 الحاق، ضمیمه‌سازی 2 عطف بیان

**appositive** *noun, adjective*

*n* ئەپۆزیتیف، بریتی، بریتە، لەباتی *adj* بەدەلی ۞ *n* عطف بیان *adj* بدلی

**appraisal** /ɔ'preızl/ *noun*, also appraisement

1 نرخاندن، هەڵسەنگاندن، مەزندە، قەبلاندن، لێکدانەوە 2 بۆچوون ۞ 1 ارزیابی، برآورد، تقویم 2 نظر

**appraising** *adjective*

بە سەنگ‌وسووکردنەوە ۞ وراندازکنان

**appreciable** /ə'pri:ʃəbl/ *adjective*

هەست‌پێکراو، بینراو، شیاوی نرخاندن، بەرچاو، دیار، گەورە: *no appreciable difference* ۞ محسوس، قابل ارزیابی، قابل ملاحظه

**appreciably** /ə'pri:ʃəbli/ *adverb*

هەست‌پێکراوانە، بەرچاوانە ۞ به طور محسوس

**appreciation** /əˌpri:ʃi'eıʃn/ *noun*

1 قەدرزانی، قەدرلێنان، بایەخ، پێزانین، سپاس‌کردن، ڕێزلێنان 2 لێکدانەوە، نرخاندن، هەڵسەنگاندن 3 تێگەیشتن، پێ‌پێبردن، پێزانین، هەست‌پێکردن 4 خۆشی 5 چوونەسەرێ، هەستان، بەرزبوونەوە، زۆربوون (نرخ): *an -iation in the value of the house* ۞ 1 قدردانی، سپاس‌گزاری 2 برآورد، ارزیابی 3 درک، احساس، فهم 4 لذت 5 افزایش

**appreciative** /ə'pri:ʃətıv/ *adjective*, also appreciatoty /ə'pri:ʃətɔ:rı/

1 قەدرزان، پێزان، سپاسبێز، تێگەیشتوو: *an appreciative audience* 2 بەنیشانەی ڕێزەوە یان سپاسەوە (*appreciativeness n*) ◌ 1 قدردان، بافهم 2 مبنی بر قدردانی

**appreciatively** /əˈpriːʃətɪvli/ *adverb*
1 بەنیشانەی سپاسەوە 2 بە خۆشی ◌ 1 حاکی از قدردانی 2 با لذت

**apprehensible** /ˌæprɪˈhensəbl/ *adjective*
(کـون و ویـزەیـی) لەتێگەیشتن‌هاتوو، لەپێزانین‌هاتوو ◌ دریافتنی

**apprehension** /ˌæprɪˈhenʃn/ *noun*
1 تێگەیشتن، پێزانین، پێ‌پێبردن، بەخۆزانین، حاڵی‌بوون 2 نگەرانی، دڵەخورپە، دڵەڕاوکێ، دڵەکوتە، ترس 3 دەس‌بەسەری، ڕاگرتن، گل‌دانەوە ◌ 1 دریافت، درک، فهم 2 تشویش، ترس 3 بازداشت، توقیف

**apprehensive** /ˌæprɪˈhensɪv/ *adjective*
1 نگەران، دڵ‌لەدوا، بێ‌ئارام، ئۆقرەلێهەڵگیراو 2 زووتێگەیشتوو، زیرەک، discerning ◌ 1 بیمناک، دلواپس 2 تیزهوش discerning

**apprehensively** /ˌæprɪˈhensɪvli/ *adverb*
بە نیگەرانی(یەوە) ◌ با دلواپسی

**apprehensiveness** /ˌæprɪˈhensɪvnəs *noun*
1 نگەرانی، دڵەڕاوکێ، نارەحەتی 2 زووتێگەیشتوویی، زیرەکی، وریایی ◌ 1 دلواپسی 2 تیزهوشی

**apprentice** /əˈprentɪs/ *noun*
شاگرد، بەرووەستا، فێرخواز، پیشەشاگرد، تازەکار، نۆفێر، تازەفێر، novice: *an apprentice in cooking* ◌ کارآموز

**apprenticeship** /əˈprentɪʃɪp/ *noun*
شاگردی، فێرخوازی، تازەکاری، پیشەشاگردی، نۆفێری، بەرووەستایی: *He had served his apprenticeship as a plumber* ◌ کارآموزی

**appro** /ˈæprəʊ, US ˈæproʊ/ = on appro = on approval

**approach** /əˈprəʊtʃ, US əˈproʊtʃ/ *noun*
1 بۆچوون، دیتن، نیرین، تێڕوانین، هەڵس‌وکەوت، شێوەی جووڵانەوە 2 شێوە، ڕێک، شێواز، بار 3 ڕێگا، ڕێ، ڕێگای چوونەنێو 4 ئامێر، کەرەسە 5 لێکچوون، هاوشێوەیی 6 دەس‌ڕاگەیشتن، گەیشتن 7 نزیک‌بوونەوە، نزیکی، نزیک‌کەوتن، قەرەکەوتن، توخن‌کەوتن 8 داوا، داخوازی، پێشنیار ◌ 1 دید، برخورد، رویکرد، رهیافت 2 روش 3 راه، ورودی 4 وسیله 5 شباهت 6 دسترسی، دستیابی 7 تقرب 8 درخواست، پیشنهاد

**approachability** /əˌprəʊtʃəˈbɪlətɪ, US əˌproʊtʃ-/ *noun*
1 دەس‌پێڕاگەیشتوویی، لەگەیشتن‌هاتوویی، لەنزیک‌تر 2 ڕووخۆشی ◌ 1 قابلیت دسترسی 2 خوش‌برخوردی

**approachable** /əˈprəʊtʃəbl, US əˈproʊtʃ-/ *adjective*
1 دەس‌پێڕاگەیشتوو، لەگەیشتن‌هاتوو، لەنزیک، لەبەردەست: *friendly and -oachable people* 2 ڕووخۆش ◌ 1 دست‌یافتنی 2 خوش‌برخورد

**approaching** *adjective, adverb*
*adj* لە گەیشتن‌دا، لە گەیین‌دا، نزیکەوەبوو *adv* نزیک بە ◌ *adj* در حال فرا رسیدن *adv* در حدود

**approbation** /ˌæprəˈbeɪʃn/ *noun*
1 سەلماندن، پەسند(کردن)، بەڕاستدانان 2 ڕێک‌کەوتن 3 پیاهەڵوتن، پەسن‌دان، تاریف ◌ 1 تصویب، تأیید 2 موافقت 3 تحسین

**approbative** /ˈæprəbeɪtɪv/ *adjective,* also approbatory /əˈprəʊbətɔːrɪ/
لەگەڵ پەسن، پەسناوی، پەسن‌دەرانە، پیاهەڵبێژانە ◌ تحسین‌آمیز

**appropriate** /əˈprəʊpriət, US əˈproʊ-/ *adjective*
شیاو، لێوەشاو، گونجاو، لواو، لەبار، دروست، باش، بەڕێ‌وجێ، پێوەندی‌دار: *an appropriate response* ◌ مناسب، مقتضی، درخور، مربوط

**appropriately** /əˈprəʊpriətli, US əˈproʊ-/ *adverb*
بەشێوەیەکی گونجاو ◌ به طور مناسب

**appropriateness** /əˈprəʊpriətnəs, US əˈproʊ-/ *noun*
بۆ شیان، گونجاوی، لێوەشاوەیی، لواوی، لەباری، بەجێ‌بوون، بەڕێ‌وجێ بوون ◌ مناسب بودن

**appropriation** /əˌprəʊpriˈeɪʃn, US əˌproʊ-/ *noun*
1 تەرخان‌دان، تایبەت‌دان، بودجە، دراونامە 2 گرتن، دەس‌بەسەراگرتن، زەوت‌کردن، لێ‌سەندن، (لێ)هەڵگرتن، دزین، بڕینەبەرخۆ، دانەبەرخۆ ◌ 1 اختصاص، تخصیص، اعتبار 2 تصرف، تصاحب

**appropriative** /əˌprəʊpreɪtɪv/ *adjective*
تەرخان‌دراو، تایبەت‌دراو، تایبەتە ◌ اختصاصی

**appropriator** *noun*
داگیرکەر، بەزۆرسێن، دەس‌بەسەراگر بۆ خۆ ◌ غاصب

**approval** /əˈpruːvl/ *noun*
پەسندکردن، مۆرکردن، ڕەوابینی، ڕەزامەندی، ڕێک‌کەوتن، پەژراندن ◌ تأیید، تصویب، موافقت

**approved** *adjective*
پەسندکراو، دڵ‌پەسند، مۆرکراو، پەژرێنراو، ڕەوابینراو، بەڕاستدانراو، لەسەرڕێک‌کەوتوو ◌ تأییدشده، مورد تأیید

**approved school** *noun*
پەروەردەخانە (بۆ لاوە تاوانکارەکان) ◌ دارالتأدیب

**approving** /əˈpruːvɪŋ/ *adjective*
پەسندکاری‌یانە، بەردار، بە نیشانەی پەسندکردن:

تأییدآمیز ◌ *He gave me an approving nod*

**approvingly** /əˈpruːvɪŋli/ *adverb*

بە نیشانەی پەسندکردن ◌ بە طور تأییدآمیز

**approx** *abbreviation* 1 approximate 2 approximately

**approximate** /əˈprɒksɪmət, US əˈprɑːk-/ *adjective*

تەقریبی، پتردروست، نزیک بە، تا ئەندازەیێ (زۆر): *an approximate number/total/cost* ◌ تقریبی

**approximately** /əˈprɒksɪmətli, US əˈprɑːk-/ *adverb*

نزیکەی، بە مەزندە، لە دەوروبەری، بڵێین، تا ئەندازەیێ، بەلای نزیکی‌یەوە ◌ تقریباً، در حدود

**approximation** /əˌprɒksɪˈmeɪʃn, US əˌprɑːk-/ *noun*

1 نزیکاندن، نزیک‌کردنەوە، نزیکی، لە راستی‌یەوە نزیک 2 لێکچوویی، هاوشێوەیی (زۆر) 3 مەزندە، نرخاندن، هەڵسەنگاندن، قرساندن ◌ 1 تقریب، قرابت 2 شباهت 3 تخمین، برآورد

**approximative** /əˈprɑːksəmertɪv/ *adjective*, also approximate

نزیک بە، بەلای نزیکی‌یەوە ◌ تقریبی

**appurtenance** /əˈpɜːtɪnəns, US əˈpɜːrt-/ *noun*

1 پاشکۆ، سەرخستە، سەرخراوە 2 ماف یان تایبەت‌ماف و پریڤیلیجێکی قانوونی 3 (کۆ) پاشکۆمەنی، پاشکۆکان، شتە لاوەکی‌یەکان، شت‌ومەکی زیادی، accessories ،apparatus: *the appurtenances of wealth* ◌ ضمیمە، متعلقە 2 حق یا امتیاز قانونی 3 ملحقات، متعلقات

**appurtenant** /əˈpɜːtɪnənt, US əˈpɜːrt-/ *adjective, noun*

سەربە، پاشکەوتە، پێوەبەند، بەند، پێوەبەست، دواکەوتە، پاشکۆ، appurtenance: *-purtenant equipment* ◌ وابستە، تابع، ضمیمە

**APR** /ˌeɪ piː ˈɑː(r)/ *abbreviation* annual percentage rate

ئێی‌پی‌ئار، رادەی ڕێژەی ساڵانە ◌ ای‌پی‌آر

**Apr.** = April

**apraxia** /əˈpraksɪə/ *noun*

(پزشکی) بێ‌جێبەجێ‌نەبوونی چالاکی‌یێکی تایبەتی، لەبەر لێکەوتنی مێشک ◌ آپراکسیا

**apraxic** *adjective*, also apractic

تووش‌بوو بە ئەپراکسیا ◌ آپراکسیک

**après-ski** /ˌæpreɪ ˈskiː/ *noun*

رابواردنی شەوانە دوای سکی (بنەرەت: فەرەنسی بە واتای "پاش سکی") ◌ اپری‌سکی

**apricot** /ˈeɪprɪkɒt, US ˈæprɪkɑːt/ *noun*

1 قەیسی، قایسی، شێلانە، شلانە، هێرۆگ، مزمزە، مش‌مشیر 2 داری قەیسی [*Prunus armeniaca*] ◌ 1 زردآلو 2 درخت زردآلو

**April** /ˈeɪprəl/ *noun*

ئاپریل، ئاڤریل، ئاوریل، ئێپیریل، نوێڕۆژ، نیسان، خاکەلێوە (چوارەمین مانگی ساڵ نێوان March و May، بەپێی رۆژژمێری Gregorian؛ بنەرەت: ئینگلیسی نێوەراست، لە *avrill* ئانگلۆ-فەرەنسی، لە *Aprilis* لاتین) ◌ آوریل

**April Fool** *noun*

گۆری یا قوربانی یەکەمی نیسان ◌ آوریل فول

**April Fool's Day** *noun*

فێڵ یان درۆی یەکەمی نیسان ◌ حقەی آوریل

**a priori** /ˌeɪ praɪˈɔːraɪ/ *adjective, adverb*

پێش‌تاقی‌گەری، پێش‌ئەزموونی، پێشینی، لەوەپێشی، بیردۆزی، پێزانین لە هۆوە بە هۆکرد (بێ‌پێبردراو)، هۆدۆزی، ئەنجام‌گیری‌یانە، لێکدانەوەی هۆ، لەپێش؛ بەبێ تاقی‌کردنەوە یان تازمایشت، بەبێ تاقی‌گەری، بەبێ شی‌کردنەوە: *an priori* :presumptive ،deductive *assumption* (پروانە a posteriori؛ بنەرەت: لاتین "لەوەوە کە لە پێش‌ترە") ◌ پیشاتجربی، نظری، استنباطی، لمّی، پیشاپیش؛ بدون آزمایش یا تحلیل

**apriorism** /eɪˈprʌɪərɪz(ə)m/ *noun*

ئێپرایۆریزم ◌ اپرایوریسم

**a priorist** /eɪˈprʌɪərɪst/ *noun*

ئێپرایۆریست ◌ اپرایوریست

**apron** /ˈeɪprən/ *noun*

1 بەرەڵبێنە، بەرسینگە، بەران‌پێچ، بەرکۆشە، بەروانکە 2 پێشەوەی شانۆ یان پەردە 3 گۆرەپانی فرۆکە، راگیرگەی فرۆکە ◌ 1 پیش‌بند 2 جلو صحنه 3 میدان هواپیما

**apron stage** *noun*

پێشەوەی شانۆ یا پەردە، بەرشانۆ ◌ جلو صحنه

**apropos** /ˌæprəˈpəʊ, US -ˈpoʊ/ *adjective, adverb, preposition*

باش، لەبار، لێوەشاو، بەجێ، شیاو، لەبارەی، دەربارەی، لەمەڕ: ◊ *apropos remarks* *Apropos (of) what you were just saying...* ◌ برازندە، مناسب، درخصوص، در مورد

**apropos of** /ˌæprəˈpəʊ, US -ˈpoʊ/ *preposition*

لەبارەی، دەربارەی، لەمەڕ، لە بابەت، لە باوەت: *apropos of the preceding statement* ◌ در مورد، درخصوص

**apse** /æps/ *noun*

پش(ت)خان، دەرپەڕیوی پشتەوەی مێهراو یان مێحراب (ب.ت. کلێسە)، مێهراو یان مێحرابی کلێسە ◌ محراب کلیسا، اپس

**apsidal** /ˈapsɪd(ə)l/ *adjective*

سەربە مێهراو یان مێحرابی کلێسە ◌ وابستە بە محراب کلیسا

**apsis**[1] /'apsɪs/ (via Latin, from Gk *apsis*, *hapsis* 'arch, vault') = apse

**apsis**[2] /'apsɪs/ *noun, pl.* apsides /-di:z/
(ئەستێرەوانی) نزیکترین و دوورترین (هەردوو خاڵ یان شوێنی سوورگەی تەنێ کە نزیکترین یان دوورترینە لەو تەنە گەورەیەی کە بەدەوریدا دەسووڕێتەوە) ۞ اوج یا حضیض

**apt**[1] /æpt/ *adjective*
1 باش، گونجاو، لێهاتوو، لێوەشاو، بەجێ، لەبار: *a particularly apt name/comment* ◊ *a particularly apt description* 2 ئامادە، ساز، بەتوانا: *apt to be forgetful/careless* 3 زیرەک، زرینگ، مدریک، زووتێگەیشتوو: *an apt pupil* 4 ڕێتێچوو، بۆی هەیە، لەوانەیە ۞ 1 مناسب، شایستە 2 مستعد، قابل 3 تیزهوش 4 محتمل

**apt**[2] *abbreviation* apartment

**Aptera** *noun, pl.*
(مێروناسی) بێباڵان، بێباڵەکان ۞ آپترا

**apteral** *adjective*, also apterous /'apt(ə)rəs/
(گیانەوەرناسی) بێباڵ ۞ آپترال

**Apterygota** /ap'tɛrɪ,gəʊtə/ *noun, pl.*
(مێروناسی) ناباڵەوەران، ناباڵداران، کۆمەڵێ لە مێرووە بێباڵە سەرەتاییەکانن کە bristletail و springtail دادەگرێ ۞ آپتریگوتا

**apterygote** *noun*
مێرووی ناباڵدار یان ناباڵەوەر ۞ آپتریگوتا

**apteryx** *noun*, also kiwi 1
بێباڵە، بێباڵک(ە)، باڵندەیەکی بێباڵی نیوزیلەندە ۞ آپتریکس

**aptitude** /'æptɪtju:d, US -tu:d/ *noun*
1 بەهرە، توانایی، ئامادەیی، لێهاتوویی، تواناداری، 2 tendency, inclination زووتێگەیشتوویی، زووفێربوون، زیرەکی (*adj* aptitudinal; -inally *adv*) ۞ 1 استعداد، قابلیت 2 زودفهمی

**aptitude test** *noun*
تاقیکاری توانایی یا بەبەهرەیی ۞ تست استعداد

**aptly** /'æptli/ *adverb*
بە شێوەیەکی گونجاو، گونجاوانە، بەو شێوەی کە شیاوەیەتی یان گونجاوە، بە جێ: *the aptly named Grand Hotel* ۞ بە طور مناسب

**aptness** /'æptnəs/ *noun*
1 گونجاوی، لەباری، لێوەشاوی 2 توانایی، بەبەهرەیی ۞ 1 مناسب بودن، شایستگی 2 استعداد

**apyrectic** /,eɪpaɪ'rɛtɪk/ *adjective*, also -exial
بێتا، تێ یان تەبی نییە، بێتاوتوێ ۞ بی‌تب

**apyrexia** /eɪ,paɪ'rɛksɪə, ,æpər-/ *noun*, also apyrexy /eɪ'paɪrɛksɪ, æpət-/
داشکانی تا ۞ فترت تب

**aqua-** /'akwə/ *prefix*
پێشگر: پێوەندی بە ئاوەوە هەیە، سەربە ئاو: *aquaculture* (بنەڕەت: لە *aqua* لاتینەوە "ئاو") ۞ پیشوند: وابستە بە آب

**aqua** /'ækwə/ *noun*
ئاو، ئاڤ ۞ آب

**aqua aura** *noun*
کوارتز یا کانێکی تر کە بە توێژاڵێکی ناسکی زێڕ داپۆشراوە ۞ آکوا آورا

**aquacade** *noun*
کوفارە یان فیشقاوی بەرز ۞ فوارەی بلند

**aqua fortis** /'fɔ:tɪs/ *noun*, archaic term for nitric acid
(کیمیا) فۆرتیساو، تیزاو، تیزاب (لاتین "strong water") ۞ تیزاب

**aqualung** /'ækwəlʌŋ/ *noun*
دەزگای هەناسەدان ۞ دستگاه تنفس غواصی

**aquamanile** /,akwəmə'nʌɪli, US -'ni:li/ *noun*
گوزەڵە بە شێوەی گیانەوەرانی گواندار (شیردەر) یان باڵندەکان (بنەڕەت: لە سەدەکانی نێوەڕاستدا، لە *aquaemanalis* لاتین "گوزەڵەی ئاو") ۞ آکوامانیل

**aquamarine** /,ækwəmə'ri:n/ *noun*
1 سەوزی مەیلەوشین، سەوزی شینباو 2 زمڕودی شینباو (بەرد؛ بنەڕەت: لە *aqua marina* لاتین "ئاوی زەریا "seawater") ۞ 1 کبود 2 زمرد کبود

**aquanaut** = diver

**aquaplane** /'ækwəpleɪn/ *noun*
تەختەئاوی، تەختەی سکی ۞ تختەی اسکی

**aqua regia** /'ri:dʒə/ *noun*
(کیمیا) شائاو: تێکەڵەیێکی ترشەڵۆکەکانی nitric و hydrochloric، بۆ تواندنەوەی کانزا بەنرخەکان بەکاردێنرێ ۞ تیزاب سلطانی

**aquarelle** /,akwə'rɛl/ *noun*
ئاوەڕەنگ، ئەکواریل (لە فەرەنسی، لە *acquarella* ئیتالیایی "ئاوڕەنگ "watercolour") ۞ آب‌رنگ

**aquarellist** *noun*
ئەکواریلیست، وێنەکێش بە ئاوەڕەنگ ۞ نقاش آب‌رنگ

**aquarium** /ə'kweəriəm, US ə'kwer-/ *noun, pl.* aquaria /-rɪə/ or aquariums
ئەکواریۆم، مۆزەماسی، ئاوەژیخانە، ماسیدان ۞ آبزیدان

**Aquarius** /ə'kweəriəs, US ə'kwer-/ *noun*
1 (ئەستێرەوانی) دۆلکە، ئاوکێش (یازدەیەمین کەلوو لە زۆدیاک) 2 کۆئەستێرەیێ لە باشووری Pegasus ۞ 1 دلو 2 آکواریوس

**aquarobics** /,akwə'rəʊbɪks/ *noun, pl.*
ئێرۆبیک لەنێو ئاودا ۞ آکواروبیک

**aquatic** /ə'kwætɪk/ *adjective, noun*
*adj* بەئاوزیندوو، ئاوەژی، ئاوی *n* گیانەوەر یان ڕووەکی ئاوی ۞ *adj* آبزی، آبی *n* جانور یا

گیاه آبزی

**aquatint** /'ækwətɪnt/ *noun*
1 پرۆسەی هەڵکەندنی مس بە ترشەڵۆکی نیتریک 2 وێنەی لەو ڕێگاوە بەدەس‌هاتوو ۞ اکواتینت

**aquavit** /ˌakwə'vi:t/ *noun*, also akvavit
خواردنەوەیێ کە لە پەتاتە دروست دەکرێ (بنەڕەت: لە سویدی، نۆروێژی و دانمارکی بە واتای "ئاوی ژیان، ژیناو") ۞ آکواویت

**aqua vitae** /'vʌɪti:, 'vi:tʌɪ/ *noun*
خواردنەوەیێکی گیرا، ب.ت. براندی (بنەڕەت: لە لاتینەوە "ئاوی ژیان، ژیناو") ۞ آکوا ویتا

**aqueduct** /'ækwɪdʌkt/ *noun*
1 ئاوبارە، بۆت، بۆتک، قەمتەرە، کەتوو 2 ئاوەڕۆ، جۆگاو 3 (توێکاری) جۆگە، بۆری، شلەڕۆ ۞ 1 آباره 2 مجرا 3 (آناتومی) قنات

**aqueous** /'eɪkwiəs/ *adjective*
ئاوی، ئاوەکی، بەرهەماو (بەرهەمی ئاو)، لەئاوچوو، ئاوتیابوو، ئاودار: *an aqueous solution* ۞ آبی، آب‌مانند، حاوی آب

**aquiculture** *noun*
کشتاو، کشت‌وکاڵی بە ئاو یان نادیمی، بەراوکاری ۞ کشاورزی با آب

**aquifer** /'ækwɪfə(r)/ *noun*
ئاودار، ئاوهەڵگر، ئاوەزێ (چینێکی بەردینە کە ئاو لە خۆڕادەگرێ، جوگرافیا) ۞ آبزا

**aquiform** *adjective*
ئاوی، شێوەئاو، ئاوسا، ئاواسا ۞ آب‌گون

**Aquila** /'ækwələ/ *noun*
(ئەستێرەوانی) کەلووی هەڵۆ، کۆنەستێرەی باکووری لە باشووری Cygnus، Altair لەوێ دایە ۞ برج عقاب

**aquilegia** /ˌakwɪ'li:dʒə/ *noun*
ئاوەچنە؟، گیایێکی گوڵدەرکەرە [تۆخم *Aquilegia*] ۞ نوعی گیاه

**aquiline** /'ækwɪlaɪn/ *adjective*
1 هەڵۆیی، شێوەهەڵۆ، داڵی، هەڵۆئاسا 2 (لووت) قەلانگی، قەپۆزبەرانی، هەڵۆیی (*n* aquilinity؛ بنەڕەت: لە *aquila* لاتین "هەڵۆ") ۞ 1 عقابی، عقاب‌مانند 2 عقابی

**Ar** symb. the chemical element argon

**-ar**[1] *suffix*
پاشگر: 1 (ئاوەڵناو ساز دەکا) سەربە جۆرێکی تایبەتی: *molecular* 2 ئاوساز، ناو دروست دەکا وەک: *scholar* (بڕوانە -er[3]؛ بنەڕەت: لە -*aire*، -*ier* فەرەنسی کۆن یان -*aris* لاتین) ۞ پسوند: 1 صفت‌ساز 2 اسم‌ساز

**-ar**[2] *suffix*
پاشگر: (ناوساز): *pillar* (بنەڕەت: بە ڕێگای فەرەنسی کۆن، لە -*are* لاتین) ۞ پسوند: اسم‌ساز

**-ar**[3] *suffix*
پاشگر: (ناو ساز دەکا): *bursar* (بنەڕەت: لە -*aire*، -*ier* فەرەنسی کۆن، یان لە -*arius*، -*arium* لاتین) ۞ پسوند: اسم‌ساز

**-ar**[3] *suffix* alteration of -er[1], -or[1] (as in *liar*)

**Arab** /'ærəb/ *adjective, noun*
*adj* سەربە عەرەب یان عەرەبەکان *n* 1 عەرەب 2 ئەسپی عەرەب ۞ *adj* وابستە بە عرب یا اعراب *n* 1 عرب 2 اسب عرب

**arabesque** /ˌærə'besk/ *adjective, noun*
*adj* ئەرەبێسک، ئەرەبیسک، عەرەبانە *n* 1 شێوازی عەرەبی، نەخشی عەرەبی (لەودا هێڵەکان (چ هی گوڵ، پەلوپۆ foliage، میوەکان، گیانەوەران و نەخشونیگار) تێک ئالاون و نەخشێکی ئاڵۆز یان پێچەڵاوپێچیان پێکهێناوە) 2 (لە بالێ‌دا) ژێست و وێستانێکە pose کە سەماکێش لەسەر پایێ بە دەستێ کێشراو لە پێشەوە و لاقەکەی تری بۆ دواوە کێشراو ڕادەوێستێ 3 (موسیقا) پارچە موسیقایێ کە زۆرتر بۆ پیانۆیە 4 نەخشێکی ورد و تێک‌چنراو و ئاڵۆز: *richly pierced by an arabesque of wormholes* — John Chase ۞ آرابسک

**Arabian** /ə'reɪbiən/ *adjective, noun*
*adj* 1 سەربە عەرەب یان عەرەبەکان 2 سەربە عەرەبستان یان سعودیا *n* 1 خەڵکی سعودیا 2 = arabian horse ۞ *adj* 1 وابستە بە عرب یا اعراب 2 وابستە بە عربستان *n* اهل عربستان

**Arabian horse** *noun*
نژادی عەرەبی، لەبەر خێرایی، زیرەکی و ئەندامڕێکی جێی سەرنجە (لە بنەڕەتا عەرەبستان سەری هەڵداوە) ۞ اسب عربی

**Arabic** /'ærəbɪk/ *adjective, noun*
*adj* سەربە عەرەب یان عەرەبەکان، سەربە (زمانی) عەرەبی *n* زمانی عەرەبی، عەرەبی ۞ *adj* وابستە بە عرب یا اعراب *n* زبان عربی

**Arabicization** *noun*
1 (زمان یان تایبەتمەندی زمانەوانی) عەرەبی‌کردن، عەرەباندن، کردنەعەرەبی لە شێوەدا ۞ اربیسیزاسیون

**Arabic numerals** *noun, pl.* also Arabic figures
ڕەنووس یان ژمارە عەرەبی‌یەکان (وەک 0, 1, 2, 3, 4, 5, 6, 7, 8 و 9) ۞ ارقام عربی

**arability** *noun*
لەکێلان‌هاتوویی، کێڵراوی، گونجان بۆ کێلان ۞ مزروعی

**arabinose** /'arəbɪnəʊz, -s/ *noun*
(کیمیا) شەکرێ کە پێکهێنەرێکی زۆربەی سریش و چەسپی ڕووەکەکانە، جۆرێ شەکری ئالدۆزی کریستاڵی سپی $C_5H_{10}O_5$، ب.ت. لە سریش و چەسپی سەوزە دایە ۞ اربینوز

**arabinosic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە ئەرەبینۆزەوە هەیە ۞

وابسته به اربینوز

**arabinoside** *noun*
ئەرەبینۆساید: گلیکۆسایدی ئەرەبینۆز، ب.ت. بۆ چارەسەری antiviral بەکاردێترێ ◌ اربینوسید

**arabis** /ˈarəbɪs/ *noun*
ئارابیس: گیایێ کە گوڵی پەمەیی و سپی دەکا [توخم *Arabis*] ◌ ارابیس

**Arabism** *noun*
1 چاند (فەرهەنگ) یان ناسنامەی عەرەبی 2 وشە یان دەستەوشەی عەرەبی ◌ 1 فرهنگ یا هویت عربی 2 واژه یا عبارت عربی

**Arabist** *noun, adjective*
خوێندکار یان پسپۆڕی زمان، کولتوور یان مێژووی عەرەب ◌ اربیست

**arable** /ˈærəbl/ *adjective, noun*
*adj* کێڵراو، شیاوی چاندن یان کێلان *n* کێڵگە، زەوی گونجاو بۆ کێلان، زەوی جووتیاری ◌ *adj* مزروعی *n* زمین مزروعی

**Arab League** *noun*
یەکێتی عەرەب، کۆمکاری عەرەب ◌ اتحادیەی عرب

**aracari** /ˌarəˈsɑːri, US ˌarəˈkɑːri/ *noun, pl.* aracaris
ئاراساری، ئاراکاری: دەنووکزلەی ڕەنگینی چکۆلە، بە دەنووکی برگەبرگەوە [توخم *Pteroglossus*: چەندین جۆرن] ◌ آراکاری

**arachidonic acid** /əˌrakɪˈdɒnɪk/ *noun*
(زیندەکیمیا) ترشەلۆکی ئاراکیدۆنیک $C_{20}H_{32}O_2$، لە پیو و بەزی (زۆربەی) گیانەوەراندا هەیە و پێکهێنەری سەرەکی خۆراکی مرۆڤە ◌ اسید آراکیدونیک

**arachnid** /əˈræknɪd/ *adjective, noun,* also arachnidan
(گیانەوەری) جاڵجاڵۆکەیی ◌ (جانور) عنکبوتی

**Arachnida** /əˈraknɪdə/ *noun, pl.*
جاڵجاڵۆکەییەکان، جاڵجاڵۆکیان، spider، scorpion، mite و tick دەگرێتەوە (بنەڕەت: لاتینی نوێ، لە *arakhnē* یۆنانی "spider") ◌ عنکبوتیان

**arachnoid** /əˈraknɔɪd/ *adjective, noun*
*adj* جاڵجاڵۆکەئاسا، شێوەجاڵجاڵۆکە *n* (توێکاری) ناسکەپەردەی نێوەڕاستی مێشک و مۆخی بڕبڕە، داوەجاڵجاڵۆکەیی، جاڵجاڵۆکەیی، تەفنۆکەیی، پەردەی جاڵجاڵۆکەیی ◌ *adj* عنکبوت‌مانند *n* تارعنکبوتی

**arachnoid membrane** = arachnoid2

**arachnophobia** /əˌraknəˈfəʊbɪə/ *noun*
(لە)جاڵجاڵۆکەترسی، (لە)جاڵجاڵۆکەتۆقیوی (arachnophobe *n*) ◌ عنکبوت‌هراسی

**arachnophobic** *adjective, noun*
(لە)جاڵجاڵۆکەترس، (لە)جاڵجاڵۆکەتۆقیو ◌ عنکبوت‌هراس

**aragonite** /ˈarəg(ə)nʌɪt/ *noun*
ئاراگۆنیت: کانی کە کاربۆناتی کالسیۆمی calcium carbonate تیایە و شێوەی calcite دەدا (*adj* aragonitic: سەربە ئاراگۆنیت؛ بنەڕەت: لە *Aragonit* ئەڵمانی، لە ناوی ناوچەی *Aragon* لە سپانیا + -ite[1]) ◌ آراگونیت

**arak** /əˈrak/ = arrack

**aralia** /əˈreɪlɪə/ *noun*
ئارالیا، ئەرەیلیا: دار یان دەوەنێ لە کۆمەڵێکی جیاواز، لەبەر پەڵوپۆکەی دەچەقێنرێ [توخم *Aralia*] ◌ نوعی درخت یا درختچه

**Aramaean** /ˌærəˈmiːən/ *adjective, noun,* also Aramean
*adj* سەربە ئەو ناوچەیە یان ئارامییەکان *n* 1 ئەندامی گەلێ دانیشتووی Aram ی کەونار (سووریای ئێستا) و میزۆپۆتامیا Mesopotamia لە سەدەکانی 11 تا 8ی پێشزایین 2 زمانی ئارامی ◌ *adj* وابسته به آرام یا آرامی‌ها *n* 1 اهل آرام 2 زبان آرامی

**Aramaic** /ˌærəˈmeɪɪk/ *noun, adjective*
*n* زمانی ئارامی (= لقێ لە خێزانی زمانە سامییەکان، وەک زمانێکی هاوبەش لە سەدەی 6ی پێشزایینەوە لە ڕۆژهەڵاتی نزیک بەکاردێترا و و ئێستاش لەنێو هێندێ کۆمەڵدا قسەی پێدەکرێ) *adj* سەربەو زمانە ◌ *n* زبان آرامی *adj* وابسته به زبان آرامی

**arame** /ˈarəmi/ *noun*
گژوگیای دەریایی ئۆقیانووسی گەورە یان پاسیفیک کە دەخورێ و لە ئاشپەزی ژاپۆنیدا بەکاردێترێ [*Ecklonia bicyclis*] ◌ آرمی

**Aramean** = Aramaean

**Aranda** /əˈrʌntə, US aˈruːndə/ *noun,* also Arunta or Arremte, *pl.* same or Arandas
1 ئەندامی گەلێکی ڕەسەنی Aboriginal ناوەندی ئەوسترالیا 2 زمانەکەیان ◌ آراندا

**araneid** /əˈreɪnɪɪd/ *noun*
(گیانەوەرناسی) بێبڕبڕەی invertebrate دەستەیێ (Areneae) کە جاڵجاڵۆکەکان دەگرێتەوە ◌ آرانید

**Arapaho** /əˈrapəhəʊ/ *noun, pl.* same or Arapahos
1 ئاراپاهۆ: ئەندامی گەلێکی سووریێست، لە دەشتە گەورەکان دەژین 2 زمانی ئالگۆنکویایی Algonquian ئەو گەلە ◌ آراپاهو

**arapaima** /ˌarəˈpʌɪmə/ *noun*
ماسییێکی خۆراکی زۆرزلە، ڕەسەنی گەرمێنانی ئەمریکای باشووری [*Arapaima gigas*] (بنەڕەت: لە Tupi یەوە) ◌ آراپایما

**arational** *adjective*
ناعەقڵانی، ناعەقلانی ◌ غیرعقلانی

**Araucanian** /ˌarɔːˈkeɪmɪən/ *noun, adjective*
*n* 1 ئاراوکانیایی، ئەندامی کۆمەڵێ لە گەلانی سوورپێستی شیلی و چەندین بەش لە ئارژەنتین 2 زمانی ئەو گەلانە *adj* سەربە ئەو گەلە یان زمانەکەیان (بنەڕەت: لە *Araucania* سپانیایی، ناوچەیێکی شیلی) ◌ آراوکانیایی

**araucaria** /ˌarɔːˈkɛːrɪə/ *noun, pl.* araucarias
ئەرۆکاریا، لە تیرەی سنەوبەر [تۆخم *Araucaria*] (بنەڕەت: لە *Arauco* سپانیایی، هەرێم یان ستانی Araucania لە شیلی) ◌ اروکاریا

**araneous** *adjective*
تەون‌جاڵجاڵووکەیی، داوجاڵجاڵووکەیی، جاڵی ◌ تارعنکبوتی

**Arawak** /ˈarəwak/ *noun, pl.* same or Arawaks
1 ئەندامی کۆمەڵێ لە گەلانی ڕەسەنی دورگەکانی ئانتیل و باکوور و ڕۆژاوای ئەمریکای باشووری 2 هەرێەک لە زمانانی ئەو گەلانە ◌ آراواک

**Arawakan** *noun, adjective, pl.* same or Arawakans
*n* 1 ئەندامی کۆمەڵێ لە گەلانی ئەمریکای باشووری و دورگەکانی هیندی ڕۆژاوا West Indies 2 کۆمەڵە زمانی گەلانی ئاراواکان *adj* سەربە یا پێوەندی بە ئاراواکەوە هەیە ◌ *n* آراواکان *adj* وابستە بە آراواک

**arbalest** /ˈɑːbəlɛst/ *noun,* also arblast
مەنجەنیق (= یەکێ لە چەک‌وچۆڵی سەدەکانی نێوەڕاست) ◌ منجنیق

**Arbela** *noun,* geographical name
شارێکی کۆنی ئاشوور Assyria، لە ڕۆژهەڵاتی دیجلە Tigris و لە شوێنی هەولێری Erbil ئێستا (بڕوانە Gaugamela) ◌ آربلا

**arbiter** /ˈɑːbɪtə(r), US ˈɑːrb-/ *noun*
1 دادوەر، نێوبژێکار، بەریڤان، نێوگژێوان 2 حاکم، حوکمڕان، دەسەڵات‌بەدەست، خاوەن‌دەسەڵات، هێزبەدەست: *an -biter of taste/style/fashion* ◌ 1 حَکَم، داور 2 حکمران، صاحب اختیار

**arbitrable** *adjective*
شیاوی نێوگژیوانی، (بۆ) نێوگژیوانی دەکرێ یان دەبێ ◌ قابل حکمیت

**arbitrage** /ˈɑːbɪtrɑːʒ, -trɪdʒ, US ˈɑːrbətrɑːʒ/ *noun*
(ئابووری) ئاربیتراژ (کڕینی (وەکوو (پشک و) بەشەکانی پارەی بیانی) لە شوێنێکەوە و فرۆشتنی لە شوێنێکی‌تر) ◌ آربیتراژ

**arbitrager** /ˈɑːbɪtrɪdʒə(r), US ˈɑːrbətrɑːʒər/ *noun*
ئاربیتراژێر، یەکێ کە ئاربیتراژ دەکا ◌ آربیتراژر

**arbitrageur** /ˌɑːbɪtrɑːˈʒɜː(r), US ˌɑːrbətrɑːˈʒɜːr/ *noun,* also arbitrager
ئاربیتراژۆر ◌ آربیتراژور

**arbitral** /ˈɑːbɪtr(ə)l/ *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە نێوگژیوانی‌یەوە هەیە، سەربە arbitration ◌ وابستە بە حکمیت

**arbitrament** /ɑːˈbɪtrəm(ə)nt/ *noun*
1 نێوگژیوانی، بەریڤانی، ناوبژیوانی 2 بڕیاری دادوەر یان نێوگژیوان 3 (کۆن) ماف یان هێزی بڕیاردان ◌ 1 حکمیت 2 حکم داور 3 آربیترامنت

**arbitrarily** /ˌɑːbɪˈtrerəli, ˈɑːbɪtrəli, US ˌɑːrbəˈt-/ *adverb*
1 سەرپێشکانە، بەشێوەیەکی سەرپێشک، بەڕێکەوت، ڕەمەکی‌یانە، هەڕەمەکی‌یانە 2 بەزۆر، زۆرەملی‌یانە، زۆردارانە ◌ 1 بە طور اتفاقی، دلبخواهی 2 مستبدانە

**arbitrariness** /ˈɑːbɪtrərinəs, ˈɑːbɪtrinəs, US ˈɑːrbətrerinəs/ *noun*
زۆرداری، ملهوڕی ◌ استبداد

**arbitrary** /ˈɑːbɪtrəri, ˈɑːbɪtri, US ˈɑːrbətreri/ *adjective*
1 بەدەسخۆیی، مەیلی، خۆحەزی، بە دڵی خۆ، بە پێخۆش‌بوون، نازۆرەملی، سەرپێشکی، ڕەمەکی، بەڕێکەوت، هەڕەمەکی 2 بەزۆری، زۆرەملێ، زۆرداری، ملهوڕی، سەرەڕۆ، دیکتاتۆریاڵ، زۆردار، ملهوڕ، autocratic ◌ 1 اختیاری، اتفاقی 2 مستبدانە، خودسرانە، استبدادی، مستبد، خودکامە

**arbitration** /ˌɑːbɪˈtreɪʃn, US ˌɑːrb-/ *noun*
دادوەری، داوەری، نێوگژیوانی، ناوبژیوانی، بەریڤانی (*adj* arbitrational: سەربە یان پێوەندی بە نێوگژیوانی‌یەوە هەیە؛ arbitrative *adj*: سەربە نێوگژیوانی) ◌ حکمیت

**arbitrator** /ˈɑːbɪtreɪtə(r), US ˈɑːrb-/ *noun*
دادوەر، داوەر، نێوگژیوان، ناوەندیار، ناوبژیوان، بەریڤان ◌ داور

**arbitress** *noun*
دادوەر، داوەر، نێوگژیوان، ناوبژیوان (ژن) ◌ داور (زن)

**arblast** /ˈɑːblɑːst/ = arbalest

**arbor**[1] = arbour

**arbor**[2] /ˈɑːbə/ *noun*
1 تەوەر، تەوەرە 2 دار، درەخت 3 چیمەن، مێرگ، بزوێن 4 باخ (ی میوە، لە لاتین "دار، میل shaft") ◌ 1 محور 2 درخت 3 چمن 4 باغ

**arboreal** /ɑːˈbɔːriəl, US ɑːrˈb-/ *adjective*
دارین، داری، پێوەندی بە دارەکانەوە هەیە، سەربە دار، دارەژی، دارژی، دارنشین، لەسەرداری: *arboreal monkeys* (arboreality *n*؛ arboreally /ɑːˈbɔːriəli, US ɑːrˈb-/ *adv*) ◌ درختی، درخت‌زی

**aboreous** *adjective*
دارئاسا، شێوەدار، داری ◌ درخت‌وار

**arborescence** *noun*

دارئاسایی، شێوەداری، لەدارچوویی ۞ دختواری، درختمانندی

**arborescent** /ˌɑːbəˈrɛs(ə)nt/ *adjective*

(ڕووەکناسی) دارئاسا، شێوەدار، لەدارچوو ۞ دختوار، درختمانند

**arboretum** /ˌɑːbəˈriːtəm, US ˌɑːrb-/ *noun, pl.* ms or arboreta /-tə/

ئاربۆریتیم، دارگە، باخێ بۆ توێژینەوەی زانستی ۞ اربوریتوم

**arboriculture** /ˈɑːb(ə)rɪˌkʌltʃə, US ɑːˈbɔː-/ *noun*

چەقاندن یان ڕواندنی دار و دەوەن، دارچەقێنی (arboricultural *adj*: سەربە دارچەقێنی؛ arboriculturist *n*: دارچەقێن) ۞ درختکاری

**Arborio** /ɑːˈbɔːrɪəʊ/ *noun*

ئاربۆریۆ: جۆرێ برنجی دەنکخڕی ئیتالیایی، بۆ لێنانی risotto بەکاردێترێ (بنەڕەت: لە ناوی *Arborio* لە باکووری ئیتالیا) ۞ آربوریو

**arborist** *noun*

دارناس ۞ درختشناس

**arborization** /ˌɑːb(ə)rʌɪˈzeɪʃ(ə)n/ *noun*, also arborisation

پێکهاتەیێکی داری لە کۆتایی ڕیشاڵێکی دەماری(دا) ۞ آربوریزاسیون

**arbor viate** /ˌɑːbə ˈvʌɪtiː, US ˈviːtʌɪ/ = another term for thuja

**arbour** /ˈɑːbə(r), US ˈɑːrb-/ *noun*, US arbor

کەپر، سابات، لۆیک، کولک، زنج، سەیوان (arboured *adj*) ۞ آلاچیق

**arbutus** /ɑːˈbjuːtəs, US ˈɑːbjʊtəs/ *noun*

(ڕووەکناسی، لە لاتینەوە) دار یان دەوەنی هەمیشەسەوزی تیرەیی strawberry کە دادەگرێ (توخم *Arbutus*) ۞ آربیوتوس

**arbovirus** /ˈɑːbə(ʊ)ˌvʌɪrəs/ *noun*

(پزشکی) کۆمەڵە ڤایرۆسێ کە ب.ن. دەبنە هۆی dengue و encephalitis ،yellow fever لە لایەن mosquito، گەنە و arthropod ەکانی ترەوە تووش دەبێ و ڕادەگوێزرێ ۞ آربوویروس

**arc** /ɑːk, US ɑːrk/ *noun*

1 کەوانە، نیوەبازنە، مانگیلە 2 تاق 3 کەوانەی ئێلیکتریکی (بنەڕەت: بە ڕێگای فەرەنسی کۆن لە *arcus* لاتین "bow") ۞ 1 قوس 2 تاق 3 قوس الکتریکی

**arcade** /ɑːˈkeɪd, US ɑːrˈk-/ *noun*

ڕیزەوی کەوانەسەر یان تاقدار، بازار، قەیسەری، ڕاستەبازار، زنجیرەتاق، بازاڕی سەرداپۆشراو ۞ پاساژ، تیمچە

**Arcadian** *adjective, noun*

*adj* 1 سەربە ئارکادیا 2 لادێیی، سادە *n* ڕەسەنێکی ئارکادیا، ئارکادیایی، ناوچەیێکی شاخاوی باشووری یۆنان (Arcadianly *adv*) ۞ *adj* 1 وابسته به آرکادیا 2 روستایی *n* بومی آرکادیا

**arcane** /ɑːˈkeɪn, US ɑːrˈk-/ *adjective*

نهێنی، نەهێنی، نەتەنی، پەنامەکی، شاراوە، ڕازاوی، ڕازمەند: mysterious ،secret *arcane explanations* ◊ *arcane rites* (arcanely *adv*: بە نهێنی، بە نەتەنی، بە پەنامەکی) ۞ سری، مخفیانه، پنهانی، اسرارآمیز

**arcanum** /ɑːˈkeɪnəm/ *noun, pl.* arcana

ڕاز، نهێنی، سڕ، نەتەنی، ڕاز یان نەهێنی کیمیاگەری ۞ سر، راز کیمیاگری

**arch**[1] /ɑːtʃ, US ɑːrtʃ/ *noun*

1 تاق، کەوانە، کەمەر، بۆت، هەوق 2 کەمە، مانگیلە، نیوبازنە، لابازنە، هەیڤک 3 کەوانەی پێ، چاڵی بنی پا، زگی پێ (بنەڕەت: لە *arche* فەرەنسی کۆن، لە *arcus* لاتین "bow") ۞ 1 تاق 2 هلال، کمان 3 قوس کف پا

**arch**[2] /ɑːtʃ, US ɑːrtʃ/ *noun*

1 سەرەکی، *your arch* :chief ،principal *opponent* 2 شەیتان، ناجسن، قۆشمە، دێز، شلۆق، mischievous: شەیتانانە، فێڵاوییانە (archness *n* ؛ archly *adv*) ۞ 1 اصلی 2 ناقلا، تخس؛ مکارانه، شیطنتآمیز

**arch-** /ɑːtʃ, US ɑːrtʃ/ *prefix*

پێشگر: سەرەک، سەرەکی، سەر، بنە، بنگەهی، بنەڕەتی، هەرەگرنگ: *archbishop* ،*archfiend* *archdiocese* (بنەڕەت: لە ڕێگای لاتینەوە لە *arkhi-* یۆنانی، لە *rkhos* "chief") ۞ پیشوند: اصلی، عمده، اَبَر، مهمترین

**-arch** /ɑːk/ *suffix*

پاشگر: سالار، شا، سەردار، میر، دەسەڵاتدار، ڕێبەر، پێشەوا، سەرۆک: *matriarch* ،*monarch* (بنەڕەت: لە *arkhos* یۆنانی "ruling"، لە *arkhein* "to rule") ۞ پسوند: ـحکمران، سالار

**archae-, archaeo- also archeo-** *prefix*

پێشگر: سەرەتا، سەرەتایی، دەسپێک، بەرایی، کۆن، کەڤن: *archaeoastronomy*، *archaeopteryx* (بنەڕەت: لە *arkhaios* یۆنانی "ancient"، لە *arché* "سەرەتا، دەسپێک "beginning") ۞ پیشوند: نخست، قدیمی، اول

**archaea** /ɑːˈkiːə/ *noun, pl.*

(زیندەناسی) کۆنەبەکتریاکان، بەکتریاسەرەتاکان: ئەو وردەزیندەوەرانەی کە لەباری ئەندازە و سادەیی پێکهاتەیاندا هاوشێوەی بەکتریاکانن بەلام ئەمانە کۆمەڵێکی کۆنن کە دەسبەجێ دەکەونە نێوان بەکتریاکان و eukaryote ەکان (archaeal *adj*: سەربە کۆنەبەکتریاکان یان بەکتریاسەرەتاکان؛ archaean *n, adj*: سەربە کۆنەبەکتریاکان، پێوەندی بە بەکتریاسەرەتاکانەوە

هەیە، سەربە archaea) ۞ آرکیا

**Archaean** /ɑː'kiːən/ *adjective*, US Archean

1 (زەویناسی) ئارکائیەن، ئارکیەن (پێوەندی هەیە یان ئامازە بە بەشی سەرەتای کۆسەردەمانی پریکامبریەن Precambrian (دەوروبەری 2500 ملیۆن ساڵ لەوە پێش) دەکا کە لەودا هیچ ژیانی لەسەر عەرز نەبووە. بنەڕەت: لە *arkhaios* یونانی "کۆن") 2 = Precambrian ۞ آرکائین

**archaebacteria** /ˌɑːkɪbak'tɪərɪə/. sing. archaebacterium– another term for archaea

**archaebacterial** *adjective*

سەربە کۆنەبەکتریاکان یان بەکتریاسەرەتاکان ۞ وابسته به آرکیا

**archaeastronomy** *noun*

لێکۆڵینەوەی زانیاری یان ئالیجی ئەستێرەوانی چاند یان کولتوورە پێشمێژووەکان ۞ آرکیواسترونومی

**archaeological** /ˌɑːkiə'lɒdʒɪkl, US ˌɑːrkiə'lɑːdʒ-/ *adjective*

شوێنەوارناسییانە، سەربە کۆنەوارناسی، سەربە شوێنەوارناسی، سەربە یان پێوەندی بە باستانناسییەوە هەیە ۞ باستانشناختی

**archaeologist** /ˌɑːki'ɒlədʒɪst, US ˌɑːrki'ɑːl-/ *noun*

شوێنەوارناس، باستانناس، کۆنەوارناس، باستانەوان ۞ باستانشناس

**archaeology** /ˌɑːki'ɒlədʒi, US ˌɑːrki'ɑːl-/ *noun*, US also archeology

شوێنەوارناسی، باستانناسی، کۆنەوارناسی، باستانەوانی ۞ باستانشناسی

**archaemetry** /ˌɑːkɪ'ɒmətri/ *noun*

شوێنەواریپێوی، کۆنەواریپێوی ( archaemetric *adj*) ۞ آرکیومتری

**archaeocyte** *noun*

سەرەتاخانە، خانەی سەرەتایی، پێشخانە ۞ سلول آغازین

**archaeophyte** *noun*

کۆنەڕووەک، کۆنەگیا، گیاکۆن، گیای سەرەتایی، پێشگیا ۞ کهنرُست

**archaeopteryx** /ˌɑːkɪ'ɒptərɪks/ *noun*

کۆنەباڵ، کۆنباڵ(ـە): کۆنترین بووبەردی fossil ناسراوی باڵندە، هی دوایی‌یەکانی سەردەمی ژوراسیک Jurassic باڵ و پەڕی شێوەی باڵندە، بەڵام ددان و کلکی شێوەی دایناسۆری دەدا (بنەڕەت: لە -archaeo + *pterux* یونانی "باڵ") ۞ آرکیوپتریکس

**Archaezoic** = archaean

**archaic** /ɑː'keɪɪk, US ɑːr'k-/ *adjective*

1 کۆن، کەڤنار، باستانی 2 لەباوکەوتوو، لەبرەوکەوتوو، مردوو، بێباو، کوێرەوەبوو، بێبرەو، دێرین، زووین، an :antiquated 3 سەرەتایی، بەرایی: *archaic art* ◊ *archaic word* 4 *archaic legal traditions* (Archaic) سەربە سەردەمی، دەوروبەری 8000 پێشزایین تا 1000 پێشزایین و فەرهەنگ و چاندەکانی ئەمریکای باکووری ۞ 1 باستانی 2 منسوخ، مهجور، قدیمی 3 ابتدایی 4 آرکائیک

**archaically** /ɑː'keɪɪkli, US ɑːr'k-/ *adverb*

1 بە کۆنی، بە شێوەیێکی کەڤنار، بە شێوەیەکی باستانی 2 بە شێوەیێکی سەرەتایی یان بەرایی، بەرایی‌یانە ۞ 1 به طور باستانی 2 به طور ابتدایی

**archaism** /'ɑːkeɪɪzəm, US 'ɑːrk-/ *noun*

1 وشە یان دەستەوشەی کۆن یان بێبرەو 2 کۆنگەری، کەونارگەری، دێرینخوازی ۞ 1 واژه یا اصطلاح مهجور 2 باستانگرایی

**archaist** /'ɑːkeɪɪst, US 'ɑːrk-/ *noun*

کۆنگەر، کۆنخواز، کەونارگەر، دێرینخواز ۞ باستانگرا

**archaistic** *adjective*

دێرینخوازانە، کۆنخوازانە، کەونارگەرانە، باستانخوازانە، کۆنگەرانە ۞ باستانگرایانه

**archangel** /'ɑːkeɪndʒl, US 'ɑːrk-/ *noun*

1 سەرفریشتە، سەرەکفریشتە، گەورەفریشتە: (archangels) 2 *the archangel Gabriel* دەستەیێکی فریشتەکان (بڕوانە celestial hierarchy) ۞ مَلَک مقرب

**archanthropine** *noun*

سەرمرۆڤ، سەرەتامرۆڤ، مرۆڤی سەرەتایی ۞ انسان ابتدایی

**archbishop** /ˌɑːtʃ'bɪʃəp, US ˌɑːrtʃ-/ *noun*

سەرئۆسقوف، گەورەئۆسقوف، ئۆسقوفی گەورە ۞ أسقف اعظم

**archbishopric** /ˌɑːtʃ'bɪʃəprɪk, US ˌɑːrtʃ-/ *noun*

1 پۆست یان پلەوپایەی سەرئۆسقوف 2 مەڵبەندی سەرئۆسقوف، ناوچە یان مەڵبەندی ژێردەسەڵاتی سەرئۆسقوف ۞ 1 مقام أسقف اعظم 2 حوزه یا قلمرو أسقف اعظم

**archdeacon** /ˌɑːtʃ'diːkən, US ˌɑːrtʃ-/ *noun*

یاریدەدەری سەرقەشە، دواسەرقەشە، ئارچدیکین (ب.ت. لە کلێسەی ئەنگلیکان) ۞ شماس اعظم

**archdeaconry** *noun*, *pl.* archdeaconries

بنکە یان پلەوپایەی دواسەرقەشە ۞ مقر یا مقام شماس اعظم

**archdiocese** /ˌɑːtʃ'daɪəsɪs, US ˌɑːrtʃ-/ *noun*, archdioceses

مەڵبەندی گەورەئۆسقوف، گەورەئۆسقوفنشین، ناوچەیێ کە گەورەئۆسقوف بەرپرسیارە (archdiocesan *adj*) ۞ قلمرو اسقف اعظم

**archduchess** /ˌɑːtʃ'dʌtʃəs, US ˌɑːrtʃ-/

*noun*
(له رابردوودا) ژنی سەردۆک (archduke) یان کچی ئیمپراتۆری ئاوستریا ◌ آرکدیوشس
**archduke** /ˌɑ:tʃˈdju:k, US ˌɑ:rtʃˈdu:k/ *noun*
سەردۆک (= کوڕی ئیمپراتۆری ئاوستریا Austria) ◌ آرکدیوک
**Archean** = Archaean
**arched** /ɑ:tʃt, US ɑ:rtʃt/ *adjective*
تاقی، کەوانەیی ◌ قوسی
**archegonial** *adjective*
سەرڕەگەزەیی، سەربە سەرڕەگەزەیی ◌ وابسته به مادگی برخی گیاهان
**archegonium** /ˌɑ:kɪˈgəʊnɪəm/ *noun, pl.* archegonia /-ɪə/
(ڕووەکناسی) سەرڕەگەزە: نێرکەی ferns mosses liverworts و زۆرینەی conifer ـەکان (بنەڕەت: لاتینی نوێ، لە arkhegonos یۆنانییەوە، لە -arkhe "chief" + gonos "race") ◌ مادگی برخی گیاهان
**archenemy** /ˌɑ:tʃˈenəmɪ/ *noun, pl.* archenemies
1 سەردوژمن، دوژمنی سەرەکی، دوژمنی خوێنی، دوژمنی قەستەسەر 2 ( the Archenemy) شەیتان ◌ 1 دشمن اصلی، دشمن خونی 2 (با A) ابلیس
**archenteric** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە ئارکێنتێرۆنەوە هەیە ◌ وابسته به آرکنترون
**archenteron** *noun, pl.* archentera
پێش‌ڕیخۆڵە، ریخۆڵەی سەرەتایی: enteron ی سەرەتایی یا بۆشایی هەرسی زگۆڵە gastrula ◌ آرکنترون
**archeo-** = archae
**archeological** = archaeological
**archeologist** = archaeologist
**archeology** = archaeology
**Archeozoic Era** *noun*
سەردەمانی ژیانی هەرەکۆن (ئەمە کۆنترین سەردەمی مێژووی زەوییە کە لەودا یەکەمین بەردە نیشتووەکان پێکهاتووە. لەم سەردەمەدا هیچ جۆرە بووبەرد یان فوسیلێ لەو نیشتووانەدا نابینرێ، بەلام بەهۆی بوونی کاربۆن پێدەچێ کە لە نیوەی دووەمی ئەم سەردەمەدا جۆرێکی نزم لە گیانەوەرانی زیندوو بووبێ) ◌ دوران پارین زیوی
**archer** /ˈɑ:tʃə(r), US ˈɑ:rtʃ-/ *noun*
تیراوێژ، تیرهاوێژ، تیرخەر، کەوانەوان (ئەنگێوە، دەست‌ڕاست، دەس‌ڕاست، نیشان‌پێک unerring archer) ◌ تیرانداز
**archerfish** *noun, pl.* same or archerfishes
ماسی‌یەتیرخەرە: جۆرێ ماسی ئاوە شیرینەکان، ڕەسەنی ئاسیا، ئەوسترالیا و فیلیپین [تۆخم Toxotes: چەندین جۆرن] ◌ نوعی ماهی
**archery** /ˈɑ:tʃəri, US ˈɑ:rtʃ-/ *noun*
تیراوێژی، تیرخەری، کەوانەوانی ◌ تیراندازی
**archetypal** /ˌɑ:kiˈtaɪpl, US ˌɑ:rki-/ *adjective*
نموونە، سەرنموونەیی یان نموونەی سەرەکی: *The Beatles were the archetypal pop group* ◌ مثالی، وابسته به نمونەی اصلی
**archetypally** /ˌɑ:kiˈtaɪpli, US ˌɑ:rki-/ *adverb*
بەشێوەیەکی نموونە (یسەرەکی)، سەرنموونانە ◌ به طور نمونه (اصلی)
**archetype** /ˈɑ:kitaɪp/ *noun*
نموونەی ئیدەئال، نموونە یان مودێلی سەرەتایی، سەرنموونە، نموونەی سەرەکی، prototype: *She is the archetype of an American movie star* ◊ *He came to this country 20 years ago and is the archetype of the successful Asian businessman* ◌ الگوی نخستین، مثال اعلی
**archetypical** (archetypically *adv*) – archetypal
**archfiend** *noun*
شەیتان، دێوی گەورە ◌ شیطان
**archi- or arch-** *prefix*
پێشگر: سەرەکی، سەرەتایی، دەسپێک، بنە، بنەڕەتی، یەکەمین ◌ پیشوند: اصلی، عمده، نخستین، ابتدایی
**archidiaconal** /ˌɑ:kɪdʌɪˈak(ə)n(ə)l/ *adjective*
سەربە دواسەرقەشە یان دواگەورەقەشە ◌ وابسته به شماس اعظم
**archiepiscopal** /ˌɑ:kɪɪˈpɪskəp(ə)l/ *adjective*
سەربە گەورەقەشە یا سەرقەشە یا سەرئۆسقوف، گەورەقەشەیی ◌ وابسته به سراسقف
**archil** /ˈɑ:tʃɪl/ = orchil
**Archimedian** /ˌɑ:kɪˈmi:dɪən/ *adjective*
سەربە بیرکاری یۆنانی ئارکیمیدیس یان ئەرشمیدۆس Archimedes (287-212 پێش‌زایین) ◌ وابسته به ارشمیدوس
**Archimedian screw** *noun*
جەری ئەرشمیدۆس (بۆ هەلکێشانی ئاو) ◌ پیچ ارشمیدوس
**Archimedes' principle** /ˌɑ:kɪˈmi:di:z/ *noun*
(فیزیک) بنەمای ئارکیمیدیس یان ئەرشمیدۆس ◌ اصل ارشمیدوس
**archimandrite** /ˌɑ:kɪˈmandrʌɪt/ *noun*
1 گەورەڕەبەن، ڕەبەنی گەورە، سەرڕەبەن (لە

کلێسەی ئۆرتۆدۆکس) 2 سەرۆکخانەقا، سەرۆکدەیر ۞ 1 راهب اعظم 2 رئیس صومعە

**archipelagic** *adjective*

کۆدورگەیی، سەربە کۆمەڵە دورگە ۞ وابستە بە مجمع‌الجزایر

**archipelago** /ˌɑːkɪˈpeləɡəʊ, US ˌɑːrkɪˈpeləɡoʊ/ *noun, pl.* archipelagos or archipelagoes

کۆدورگە، کۆمەڵە دورگە، کۆمەڵە گرئاف: *the Indonesian archipelago* (بنەڕەت: لە *archipelago* ئیتالیایی، لە *arkhi-* یۆنانی + *pelagos* "دەریا (لە بنەڕەتدا ناوی دەریای ئیژە، جێگای سەرنجە بۆ ئەو هەموو دورگە و گرئافە زەبەندەی)") ۞ مجمع‌الجزایر

**architect** /ˈɑːkɪtekt, US ˈɑːrk-/ *noun*

1 ئەندازیاری بیناسازی، ئارشیتێکت، سازەوان 2 ئارشیتێکت، سازەوان: *He was one of the principal architects of the revolution* ۞ 1 مهندس معماری 2 معمار

**architectonic** /ˌɑːkɪtekˈtɒnɪk, US ˌɑːrkɪtekˈtɑːnɪk/ *adjective*

سەربە بیناسازی، پێوەندی بە سازەوانییەوە هەیە ۞ وابستە بە معماری

**architectonics** *noun, pl.*

زانستی مێعماری یان سازەوانی ۞ علم معماری

**architectural** /ˌɑːkɪˈtektʃərəl, US ˌɑːrk-/ *adjective*

سەربە سازەوانی یان مێعماری، سەربە بیناسازی: *architectural features* ۞ وابستە بە معماری

**architecturally** /ˌɑːkɪˈtektʃərəli, US ˌɑːrk-/ *adverb*

لەباری مێعمارییەوە یان سازەوانییەوە: *The house is of little interest architecturally* ۞ از لحاظ معماری

**architecture** /ˈɑːkɪtektʃə(r), US ˈɑːrk-/ *noun*

1 مێعماری، سازەوانی، بیناسازی: *to study architecture* 2 شێوازی مێعماری یان بیناسازی: *the modern architecture* ◊ *the architecture of the eighteenth century* 3 پلان یا پێکهاتەی ڕێکخستە (سیستەم)ێکی کامپیوتێری ۞ 1 معماری 2 سبک معماری 3 طرح یا ساختار سیستم کامپیوتری

**architrave** /ˈɑːkɪtreɪv/ *noun*

1 نەخش یان گەچبڕی سەر سەرکۆڵ 2 کەڵە(دەستەک، نیرگە یان کاریتە، بەسەر کۆڵەکەکاندا رایەڵ دەکرا) 3 چوارچێوەی دەوری درگا یان پەنجێرە ۞ 1 قرَسب 2 و 3 آرکیتراو

**archival** *adjective*

ئەرکیڤاڵ، بەڵگەخانەیی، سەربە ئارشیف (archivally *adv*) ۞ وابستە بە بایگانی

**archive** /ˈɑːkaɪv, US ˈɑːrk-/ *noun*, also archives /ˈɑːkaɪvz/

1 بەڵگەخانە، بەڵگار، ئەرکیڤ، ئارشیف 2 جێگا یان کۆمەڵەیێ ب.ت. لەمەڕ زانیاری (لە *archives* فەرەنسی (کۆ)، لە *archia*، *archiva* لاتین، لە *arkheia* یۆنانی "تۆمارە گشتییەکان "public records") ۞ بایگانی

**archivist** /ˈɑːkɪvɪst, US ˈɑːrk-/ *noun*

ئەرکیفیست، بەڕێوەبەری بەڵگەخانە ۞ بایگان

**archivolt** /ˈɑːkɪvəʊlt/ *noun*

تاقی توێتوێ (بە یەک ناوەندەوە) ۞ قوس مطبق

**archlute** *noun*

عوودی بۆڕ bass ۞ آرکلوت

**archon** /ˈɑːkɒn/ *noun*

1 هەریەک لە نۆ کەڵەسەرکردەی ئاتێنی کۆن، سەردەسەڵاتدار (لە یۆنانی پێشوو) 2 سەرۆک (archonship *n*) ۞ 1 آرکون 2 رئیس

**archosaur** /ˈɑːkəsɔː/ *noun*

(گیانەوەرناسی و کۆنناسی) خشۆکێ لە گروپێکی گەورە کە crocodilianـەکان سەرجەم و دایناسۆر و pterosaurـە قڕتێکەوتووەکان دادەگرێ (archosaurian *adj, n*؛ بنەڕەت: لە *Archosauria* لاتینی نوێ، لە *arkhos* "chief" یان *arkhōn* "ruler" + saur-) ۞ آرکوسور

**archpriest** *noun*

گەورەقەشە، قەشەی گەورە یان مەزن ۞ کشیش بزرگ

**arch-rival** *noun*

سەرنەیار، نەیاری سەرەکی (کەسێ) ۞ حریف اصلی

**archway** /ˈɑːtʃweɪ, US ˈɑːrtʃ-/ *noun*

گوزەر یان پاسازی سەرداپۆشراو (یان کەوانەسەر)، قەیسەری، هەروەها تاقی زوور گوزەر یان پاسازێ ۞ پاساژ سرپوشیده

**-archy** *suffix*

پاشگر: ـسالاری، فەرمانداری، شایی، میری، دەسەڵات، سەرداری، ئارکی: *monarchy* (بنەڕەت: لە *arkhein* یۆنانی "to rule") ۞ پسوند: حکومت، سالاری

**arciform** *adjective*

کەوانەئاسا، تاق‌ئاسا، چەماوە، تاقی، چەماو ۞ قوس‌مانند

**arc lamp** *noun*, also arc light

چرا یان گڵۆپی کەوانەیی ۞ چراغ قوسی

**arcograph** *noun*

کەوانگار، کەوانکێش (ئەندازە) ۞ آرکوگراف

**arctic** /ˈɑːktɪk, US ˈɑːrk-/ *adjective*

1 سەهۆڵبەند(ان)، زۆر سارد، شەختەبەند، بەستەڵەک، شکستوبەند، تۆفوبەند: *arctic air* 2 ساردوسڕ: *an arctic smile* 3 جۆری پەپوولەی بۆری کوڵکن، هی باکووران و ناوچە

[توخم Oenis]ـەکانی دنیای نوێ subarctic
◌ (arctically /'ɑ:ktɪkli, US 'ɑ:rk-/ *adv*)
1 قطبی، یخزده 2 سرد 3 نوعی پروانه

**Arctic** /'ɑ:ktɪk, US 'ɑ:rk-/ *noun, adjective*
*n* جەمسەری باکووری، ناوچەی جەمسەری باکووری، باکووران *adj* سەربە جەمسەری باکووری: *Arctic explorers* ◌ *n* قطب شمال *adj* وابسته به قطب شمال

**the Arctic** /'ɑ:ktɪk, US 'ɑ:rk-/ *noun*
1 ناوچەی باکووی، باکووران 2 ناوچەکانی دەوروبەری جەمسەری باکووری ◌ 1 منطقەی قطب شمال 2 مناطق پیرامون قطب شمال

**Arctic Circle** *noun*
سووڕگەی باکووران، خولگەی جەمسەری باکووری ◌ مدار قطب شمال

**Arctic Ocean** *noun*
ئۆقیانووسی باکووران، ئۆقیانووسی بەستەڵەک یا سەهۆڵبەندی باکووری ◌ اقیانوس منجمد شمالی

**arctic areas** *noun, pl.*
ناوچەکانی باکووران ◌ نواحی قطب شمال

**Arctogaean** /ˌɑ:ktə'dʒi:ən/ *adjective*, also Arctogean
ئارکتۆژیەن، سەربە ناوچەی جوگرافیایی Arctogea کە دەفەرەکانی Palaearctic، Nearctic، Ethiopean و Oriental دادەگری ◌ آرکتوژین

**Arcturus** *noun*, Latin, from Greek *Arktouros* "bear watcher"
ورچەوانە: ئەستێرەیێکی جێگیری زەبەلاحی magnitudeی یەکەم لە Boötesدا ◌ آرکتوروس

**arcuate** /'ɑ:kjʊət/ *adjective*
(تکنیکی) چەمیو، چەماوە، کەوانەیی: curved: *an arcuate cloud* (arcuately *adv*: چەمیوانە، بە شێوەیێکی چەماوە یا کەوانەیی) ◌ خمیده

**arc welding** *noun*
لکێنگەری کەوانەیی، لکێنکاری کەوانەیی ◌ جوشکاری قوسی

**-ard** *suffix*
پاشگر: 1 ناو ساز دەکا: *bollard* 2 ئەو ناوانە ساز دەکا کە واتایێکی سووکانەیان هەیە، ـ دەسبڵاو: *drunkard* (بنەڕەت: لە فەرەنسی کۆنەوە، لە *-hard* یۆنانییەوە "hard, hardy") ◌ پسوند: 1 اسم‌ساز 2 ـ ولخرج

**ardency** /'ɑ:dnsɪ, US 'ɑ:rdnsɪ/ *noun*
بەپەرۆشی، تامەزرۆیی، تینوتاو، بەتینی، تینسەندوویی، تینوگوڕ، گەرمی، توندی، کڵپەکردوویی ◌ اشتیاق، شدت، حرارت

**ardent** /'ɑ:dnt, US 'ɑ:rdnt/ *adjective*
1 بەپەرۆش، تامەزرۆ، تینسەندوو، بەتین، بەتاو، توند(وتیژ)، گەرم 2 کڵپەکردوو، داگیرساو، گڕگرتوو (ardently /'ɑ:dntli, US 'ɑ:r-li/ *adv*: تامەزرۆیانە، بەپەرۆشانە، بەتینەوە) ◌ 1 مشتاق، پرشور، شدید 2 مشتعل

**ardour** /'ɑ:də(r), US 'ɑ:rdər/ *noun*, US ardor
(فەرمی) تین‌وگوڕ، کڵپەکردوویی، بەتینی، سۆز، تین، تاو، جۆش، بەتاوی، تین‌وتاو، گەرم‌وگوڕی، لەشەوقی، بەپەرۆشی، هۆگری، حەز، مەیل، جۆش‌سەندوویی، دڵبەستەیی، دڵ‌تێچوون، ئەوینداری، سەوداسەری، کوڕزاوی، passion: *romantic ardour* ◌ شور و شوق، شوق، حرارت، تب و تاب، اشتیاق، علاقه، شیفتگی

**arduous** /'ɑ:djuəs, -dʒu-, US 'ɑ:rdʒuəs/ *adjective*
1 سەخت، گران، چەتوون، ئاسێ، پڕزەحمەت، قورس، دژوار، difficult: *years of arduous training* ◊ *an arduous journey across the Andes* ◊ *The work was arduous* 2 لێژ، سەرەوخوار، تەلان، لاپێ، سینەکێش، steep: *an arduous path* ◌ 1 شاق، طاقت‌فرسا 2 سرازیر

**arduously** /'ɑ:djuəsli, -dʒu-, US 'ɑ:rdʒuəsli/ *adverb*
بە سەختی، بە دژواری، بە زەحمەت(ـەوە): *They searched -ously for clues* ◌ با مشقت

**arduousnes** /'ɑ:djuəsnəs, -dʒu-, US 'ɑ:rdʒuəsnəs/ *noun*
سەختی، گرانی، چەتوونی، پڕزەحمەتی، قورسی، دژواری ◌ شاق بودن

**are**[1] /ə(r), US strong form ɑ:(r)/
شێوگی کۆ (سەردەمی ئێستا) لە کاری to be

**are**[2] /eə(r), ɑ:(r), US er, ɑ:r/ *noun*
(مێژوویی) ئار (یەکەی پێوانی ڕووبەر، بەرامبەر بە 100 میتری چوارگۆشە یا 119/6 یارد) ◌ آر

**area** /'eəriə, US 'eriə/ *noun*
1 ناوچە، مەڵبەند، دەفەر، ناوە، گۆڕەپان، ڕووبەر، پانایی، ئاست: *mountainous/desert areas* 2 بەش، پارچە، پار 3 شوێن، جێگا، جێ، وار: *The tumour had not spread to other areas of the body* 4 بوار، زەمینە، ئاقار، گۆڕەپان، مەیدان، پانتایی، بەستێن، ڕاخستە 5 بابەت، مژار 6 لکە، لەکە، پەلە 7 حەوشە، حەسار (ماڵ) ◌ 1 منطقه، ناحیه، مساحت، سطح 2 قسمت، بخش 3 محل 4 زمینه، حوزه، عرصه، حیطه 5 موضوع 6 لکه 7 حیاط خانه

**area code** *noun*, also dialing code
کۆد (تەلەفون) ◌ کد

**areal** *adjective*
سەربە ڕووپێوی، ڕووپێوییانە، پێوەندی بە ڕووپێوییەوە هەیە ◌ وابسته به مساحی

**area of discourse** *noun*
بوار یان پانتایی وتار، مەڵبەندی (گ)وتار ◌ حوزەی مقال

**areca nut** /'arɪkə nʌt/ *noun*
دەنک یان تۆوی دارئەریکا ◌ دانەی فوفل
**areca palm** /'arɪkə, US ə'ri:kə/*noun*
(هەروەها areca, *pl.* arecas) دارخورمای گەرمێنانی ئاسیا [تۆخم *Areca*] (بە ڕێگای پۆرتورگالی لە Malayalam *áḍekka*) ◌ (درخت) فوفل
**arena** /ə'ri:nə/ *noun, pl.* arenas
1 شەڕگە یان گۆرەپان یان مەیدانی شەڕی شەڕگەر یان گلادیاتۆرەکانی ڕۆم 2 گۆڕەپان، مەیدان، کایە، پانتایی، قاد، مەڵبەند، شوێنی چالاکی یان پێشبڕکێ: *the political arena* 3 گۆڕ 4 وەرزشگا، لمانی، ستادیۆم، یاریگا (بنەڕەت: لە *arena* ،*harena* لاتین "لم، لمانی، شوێنی لمانی") ◌ 1 آرنا 2 میدان، صحنه، عرصه، جولانگاه 3 گود 4 استادیوم
**arenaceous** /ˌarɪ'neɪʃəs/ *adjective*
1 لماوی، لمی، لماسا، لمی تیایە 2 (زیندەناسی) لمەژی ◌ 1 شن‌مانند، دارای شن 2 شن‌زی
**arena theatre** = theater-in-the-round
**arenavirus** /ə'ri:nəˌvʌɪrəs/ *noun*
(پزشکی) ڤایرۆس‌لمی، کۆمەڵێ لە ڤایرۆسەکانی RNA، خێزان Arenaviridae (ب.ن. ئەوانەی دەبنە هۆی lassa fever و lymphocytic choriomeningitis) ◌ آرناویروس
**arenicolous** *adjective*
(زیندەناسی) لمەژی، لەنێو لمدا ژیاو یان گەشەکردوو، لمنشین ◌ شن‌زی
**aren't** /ɑ:nt/ = 1 are not 2 am not (only used in questions)
**areola** /ɔ'ri:ələ/ *noun, pl.* areolae /-li:/
1 دەورایی، خەرمانە یان ئاڵقەی دەوری برین یان گۆی مەمک 2 بۆشایی ◌ 1 هاله 2 حفره
**areological** *adjective*
سەربە یا پێوەندی بە بارامناسی‌یەوە هەیە، بارامناسی‌یانە ◌ مریخ‌شناختی
**areologist** *noun* , *adjective*
بارامناس ◌ مریخ‌شناس
**areology** /ɛ:rɪ'ɒlədʒi/ *noun*
بارامناسی (لە *Ares* خودای شەڕ لە میتۆلۆژی یۆنانی‌دا) ◌ مریخ‌شناسی
**Areopagite** *noun*
ئەندامی دادگای (بەرزی) ئاتین Areopagus ◌ عضو آریوپاگوس
**Areopagitic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە Areopagusەوە هەیە ◌ وابسته به آریوپاگوس
**Areopagus** *noun*, Latin, from Greek *Areios pagos*, from *Areios pagos*
1 تەپ یان گردێ کە دادگای (بەرزی ئاتین) لەوێ بەڕێوەدەچوو 2 دادگای (بەرزی) ئاتین 3 هەر جۆرە دادگایی‌یێکی بەرز یا گرنگ (بە واتای گردی بارام یان Aers "hill of Ares") ◌ آریوپاگوس
**Ares** *noun*, Greek *Arabicēs*
ئەریز، بارام (خودای شەڕ لای یۆنانی‌یەکان، بەرامبەر بە Marsی ڕۆمی‌یەکان) ◌ بهرام
**arête** /ə'ret, US ə'reɪt/ *noun*
ئەرێت، تیژایی، تیغە (ب.ت. لە سویسرا) ◌ تیزه
**Arethusa** *noun*, Latin, from Greek *Arethousa*
1 ئارێتوزا، ئارێتوسا: پەری‌یێکی دارستان کە Artemis خستی‌یە ناو ئاوەوە و لە سیل بە شێوەی کانی لێ‌دەرهات، پەری‌یێکی میتۆلۆژی یۆنانی کە بووە کانی تا خۆی لە خودای ڕووبار Alpheus بدزێتەوە 2 (هەروەها arethusa، dragon's mouth) جۆرێ گیاسارمەی orchid ڕۆژهەڵاتی ئەمریکای باکووری [ *Arethusa bulbosa*] ◌ آرتوسا
**argail** /'ɑ:g(ə)li/ *noun, pl.* same
جۆرێ مەڕەکێوی شاخاوی گەورەی ئاسیایی شاخزل [*Ovis ammon*] (بنەڕەت: لە مۆنگۆلی‌یەوە وەرگیراوە) ◌ آرگایل
**argent** /'ɑ:dʒənt, US 'ɑ:rdʒ-/ *adjective*
(وێژەیی و heraldry) زیو، زیوین، زیوین (بنەڕەت: بە ڕێگای فەرەنسی کۆن لە *argentums* لاتین "زیو") ◌ نقره، سیم‌گون
**argental** *adjective*
زیوین، زیوئاسا، زیواوی، زیوهەڵگر ◌ نقره‌ای، نقره‌مانند، محتوی نقره
**argenteous** = silvery
**argentic** *adjective*
زیوین، زیوهەڵگر، زیواوی، زیوتیابوو ◌ نقره‌ای، محتوی نقره
**argentiferous** /ˌɑ:dʒ(ə)n'tɪf(ə)rəs/ *adjective*
(بەرد یان کانەکان) زیوهەڵگر، زیواوی، زیوتیابوو (بنەڕەت: لە *argentums* لاتین "زیو" + -ferous) ◌ محتوی نقره
**argentine** /'ɑ:dʒ(ə)ntʌɪn/ *adjective, noun*
*adj* (کۆن) زیوئاسا، شێوەزیو *n* زیوە، جۆرێ ماسی دەریایی [*Argentina silus* و جۆرەکانی تر] (بنەڕەت: لە *argentin*، *argentine* فەرەنسی کۆن "زیو"، لە *argentum* لاتین) ◌ *adj* نقره‌مانند *n* نوعی ماهی
**Argentine ant** *noun*
مێروولەی ئارژەنتینی [*Iridomyrmex humilis*] ◌ مورچەی آرژانتینی
**Argentinian** /ˌɑ:dʒən'tɪnɪən/ *adjective, noun*
*adj* سەربە ئارژانتین *n* ئارژانتینی، خەڵکی ئارژانتین، کەسێ لە ڕەگەزی ئارژانتینی ◌ *adj*

آرژانتینی *n* اهل آرژانتین
**argentite** *noun*
(کیمیا) ئارژانتیت ◌ آرژانتیت
**argil** /'ɑ:dʒɪl/ *noun*
گلەسوورە، گڵی ئیربار، گڵی گۆزە(گەری) ◌ خاک رس
**argillaceous** /ˌɑ:dʒɪ'leɪʃəs/ *adjective*
(زەویناسی بەرد یا نیشتووەکان) پێکهاتووە یا گڵەسوورەی تیایە ◌ رستی
**argilliferous** /ˌɑ:dʒə'lɪfəvəs/ *adjective*
گڵەسوورەی تیایە ◌ محتوی خاک رس
**argillite** /'ɑ:dʒɪlʌɪt/ *noun*
(زەویناسی) جۆرێ تەختەبەردی نیشتوو، پتر لە ماک و مەتریالی گڵەسوورە پێکهاتووە ◌ آرجیلیت، آرژیلیت
**argillitic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە ئارژیلیتەوە هەیە ◌ وابستە بە آرجیلیت
**arginine** /'ɑ:dʒɪni:n/ *noun*
ئارژینین، ئارجینین: جۆرێ ترشەلۆکی ئەمینۆی بنەرەتی، ماکێکی سەرەکییە لە خۆراکی بڕبڕەدارەکاندا $C_6H_{14}N_4O_2$ ◌ آرژینین، آرجینین
**Argive** /'ɑ:gʌɪv, US -dʒʌɪv/ *adjective, noun*
*adj* 1 سەربە شاری کۆنی Argos لە یۆنان 2 یۆنان (ب.ت. لە هۆنراوەکانی هۆمێردا Homer) *n* 1 هاوشاری ئارگۆس 2 یۆنانی (ب.ت. لە هۆنراوەکانی هۆمێردا) ◌ آرگوسی
**argle-bargle** = argy-bargy
**Argo** *noun*, Latin (genitive Argus), from Greek *Argō*
(ئەستێرەوانی) کەشتی، گەلەستێرە یان کەلووی کەشتی ◌ آرگو
**argol** /'ɑ:g(ə)l/ *noun*
1 پشقەڵ، تەرس 2 خڵتەی مەی ◌ 1 پشکل 2 دُرد شراب
**argon** /'ɑ:gɒn, US 'ɑ:rgɑ:n/ *noun*
(کیمیا) ئارگۆن، ئارگان (بە ژ.گ. 18، ن. Ar) ◌ آرگون
**Argonaut** *noun*, Latin *Argonautes*, from Greek *Argonautēs*
هەریەک لەو قارەمان و پاڵەوانانە کە لەگەڵ Jason بە کەشتی بە دوای خوری زێڕین Golden Fleece کەوتن ◌ آرگوناوت
**argosy** /'ɑ:gəsi/ *noun, pl.* argosies
1 کەشتیگەلی کارداری یان بازرگانی 2 کەلەکەشتی، کەشتی گەورە ◌ 1 ناوگان تجاری 2 کشتی بزرگ
**argot** /'ɑ:gəʊ, US 'ɑ:rgət, -goʊ/ *noun*
(فەرەنسی) ئارگۆ، زمانی تایبەتی کۆمەڵێ ب.ت. دزەکان ◌ آرگو

**argotic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە ئارگۆوە هەیە ◌ وابستە به آرگو
**arguable** /'ɑ:gjuəbl, US 'ɑ:rg-/ *adjective*
1 جێی گومان، گومانلەسەر، مشتومڕلەسەر، قسەلەسەر، نامسۆگەر 2 شیاوی بەڵگەهێنانەوە ◌ 1 محل تردید، قابل بحث 2 قابل استدلال
**arguably** /'ɑ:gjuəbli, US 'ɑ:rg-/ *adverb*
1 مشتومڕلەسەرانە 2 بە ئەگەرێکی زۆرەوە، زۆر لەوەدەچێ، زۆر لەوانەیە ◌ 1 به طور قابل بحث 2 به احتمال قوی
**argument** /'ɑ:gjumənt, US 'ɑ:rg-/ *noun*
1 مشتومڕ، مشەرعێن، دەمەقاڵێ، دەمەدەمە، شەڕەقسە: ◊ *to win/lose an argument* 2 بەڵگەهێنانەوە: *After some heated argument a decision was finally taken* 3 *Her main argument was a moral one* وتوویژ، دانوستان، گفتوگۆ 4 بەڵگە، پرنۆ 5 کورتە، پوختە (ب.ت. بەرهەمێکی ویژەیی): *a later editor added an argument to the poem* ◌ 1 جروبحث، مشاجره، دعوا، مجادله 2 استدلال 3 گفتگو 4 دلیل، برهان 5 خلاصه
**argumentation** /ˌɑ:gjumən'teɪʃn, US ˌɑ:rg-/ *noun*
1 بەڵگەهێنانەوە 2 مشتومڕ، دانوستان، چەندوچۆن، debate، discussion ◌ 1 احتجاج 2 بحث، مباحثه، مناظره
**argumentative** /ˌɑ:gju'mentətɪv, US ˌɑ:rg-/ *adjective*
1 بەڵگەهێنانەوەیی 2 مشتومڕباز، فێرەمشتومڕ، مشتومڕخواز، دەمەوەر، سەربەکێشە، زمانباز، disputatious: *Everyone in the family was argumentative* (argumentativeness *n*) ◌ 1 استدلالی 2 اهل مشاجره، دعوایی
**argumentatively** /ˌɑ:gju'mentətɪvli, US ˌɑ:rg-/ *adverb*
بەشێوەیەکی بەڵگەهێنانەوەیی ◌ به طور استدلالی
**argus** /'ɑ:gəs/ *noun*
1 جۆرێکی pheasant کلکدرێژی ئاسیایی، بە خاڵ یان پنکەی چاوئاساوە لەسەر باڵەکانی [*Argusianus argus*] 2 پەپوولەیێکی قاوەیی یا شینباو، بە خاڵ و پنکەی چاوئاساوە [*Aricia* و تۆخمەکانی تر] 3 (Argus) ناوی ئاگادێرێکی ئەفسانەی یۆنانییە کە سەدچاوی بووە (و بە دەستی هێرمێس کوژرا)، دێوی سەدچاو) ◌ آرگوس
**Argus-eyed** *adjective*
قوت، وریا، وشیار، زیت، ئاگادار، گوێقوڵاخ، چاوتیژ، تیژبین ◌ مواظب، مترصد، تیزبین
**argute** /ɑ:'gju:t/ *adjective*

(دەگمەن) زیرەک، قوت، وریا، وشیار، زیت، مدریک، زرینگ، پرهۆش ۞ زرنگ، باهوش

**argy-bargy** /ˌɑːdʒi ˈbɑːdʒi, ˌɑːrdʒi ˈbɑːrdʒi/ *noun, pl.* argy-bargies

(نافەرمی) مشتومڕ، هەراوهوریا، بگرەوبەردە، تێکەولێکە، هەراوهەلا، هەلا، جەنجالی، دەمەقرە، مشەرعێن ۞ الم‌شنگه، جروبحث

**argyle** /ˈɑːgaɪl, US ˈɑːrgaɪl/ *noun,* also argyll

نەخشی جاجمی: جۆرێ نەخشی ئەندازەیی بۆ چنینی جلوبەرگ و شتی وا بە شێوەی لەبزینە یان ئەلماسی؛ هەروەها گۆرەوییێ کە بەم نەخشە (بەرمالی‌یە) دەچنرێ (بنەڕەت: لە ناوی *Argyll* لقێکی تیرەی کامبێلی Campbell سکاتلەندی، ئەم نەخشە هی ئەوانە) ۞ آرگایل

**arhat** /ˈɑːhat/ *noun*

(لە بودائیزم و جاینیزمدا) بەرزترین پایەی ئایینی بۆ پیاوانی دینی ئەو تیرانە (بنەڕەت: لە سانسکریتەوە "meritorious") ۞ آرهات

**arrhythmic** = variant spelling of arrhythmic

**aria** /ˈɑːriə/ *noun*

(موسیقا) ئاریا (ب.ت. لە ئۆپێرا و ئۆراتۆریۆ)، ئاواز ۞ آریا، لحن

**Ariadne** *noun,* Latin, from Greek *Ariadnē*

کچی مینۆس Minos، یارمەتی تێسۆس Theseusی دا تا لە هەزار بە هەزارەکە labyrinth هەلێ (بنەڕەت: لە *Ariadnē* یۆنانی‌یەوە) ۞ آریادنه

**-arian** *suffix*

پاشگر: ـلایەنگر، باوەڕ بە، پشتیوان، خاوەنی، دار: *vegetarian* (بنەڕەت: لە پاشگری *arius* لاتینەوە) ۞ پسوند: ـپیرو، معتقد به، هوادار، دارای

**Arian** *noun, adjective*

*n* لایەنگری باوەڕی ئاریانیزم *adj* سەربە یان پێوەندی بە Arianism ـەوە هەیە ۞ *n* طرفدار آریانیسم *adj* وابسته به آریانیسم

**Arianism** *noun*

(یەزدانناسی کریستانیەت) باوەڕێ کە خودابوونی عیسا هەلدەوەشێنێتەوە و لە لایەن قەشەی ئەسکەندەریە Arius Alexandrian (دەورووبەری 336-250) خرایەروو ۞ آریانیسم

**arid** /ˈærɪd/ *adjective*

1 وشک، ئیشکارۆ، زەها، قاقڕ، بێ‌ئاو، کەم‌ئاو، کەم‌باران، بێ‌باران، (وشک‌و)برینگ، بوورە: *arid and semi-arid deserts* 2 بێهوودە 3 ناخۆش، قۆڕ، هیچ، وەڕەسکەر، ماندووکەر، jejune: *an arid discussion* ۞ 1 خشک، بایر، لم‌یزرع، کم‌باران 2 بی‌ثمر 3 ملالت‌آور

**aridity** /əˈrɪdəti/ *noun*

1 وشکی، بێ‌ئاوی، کەم‌ئاوی، قاقڕی، کەم‌بارانی 2 وەڕەسکەری، هیچی، ناخۆشی ۞ 1 خشکی، کم‌آبی 2 بی‌روحی، ملالت‌آوری

**aridly** /ˈærɪdli/ *adverb*

بەشێوەیەکی وەڕەسکەر یان ناخۆش ۞ به طور ملالت‌آور

**aridness** /ˈærɪdnəs/ *noun*

1 وشکی، زەهایی، ئیشکارۆیی، بێ‌ئاوی، کەم‌ئاوی 2 ناخۆشی ۞ 1 خشکی، کم‌آبی 2 بی‌روحی

**Ariel** *noun*

گیانی تەفرەدەر یا شۆخ لە the tempestی شەکسپیەردا ۞ آریل

**Aries** /ˈeəriːz, US ˈeriːz/ *noun*

1 (ئەستێرەوانی) بەرخ یان کاوڕ (= یەکەمین کەلووی زۆدیاک) 2 بەرانە: کۆئەستێرەیێ constellation نێوان Pisces و Taurus 3 (رۆمی کۆن) کەللەبەران ۞ 1 حَمَل، بره 2 قوچ قلعه‌کوب، آریس

**aright** /əˈraɪt/ *adverb*

(بێ‌باو) بە دروستی، دروست، بەشێوەیەکی ڕاست، correctly ,right: *if I remember aright* ۞ به درستی، به طور صحیح

**Arikara** *noun, pl.* same

1 ئەندامی گەلێکی سوورپێستی ئەمریکایی دۆلی رووباری میسۆری Missouri لە داکۆتای Dakota باکووری 2 زمانی ئاریکارا ۞ آریکارا

**aril** /ˈærɪl/ *noun*

(رووەکناسی) بەرگی دەرەوەی توو (وەک yew) ۞ پوشش بیرونی بذر

**arillate** *adjective*

خاوەنی بەرگی دەرەوەی توو ۞ دارای پوشش بیرونی بذر

**ariose** /ˌærɪˈəʊzəʊ, -səʊ/ *noun, adjective, adjective*

(موسیقا) *n* (ب.ت. لە ئۆپێرا یان ئۆراتۆریۆ oratorio) شێوازێکی پێرفۆرمانسی دەنگی کە لەچاو ئاریا aria کەم‌فەرمی تر بێ *adj adv* بە پێی شێواز یان شێوەیێکی وا ۞ اریوز

**-arious** *suffix*

پاشگر: ـتایبەت، سەربە: *gregarious* (بنەڕەت: لە پاشگری *arius* لاتینەوە + ous-) ۞ پسوند: ـویژه، وابسته به

**arisen** /əˈrɪzn/ = past participle of arise

**aristo,** *pl.* aristos = aristocrat

**aristocracy** /ˌærɪˈstɒkrəsi, US -ˈstɑːk-/ *noun, pl.* aristocracies

1 سەرچین‌سالاری، حکومەتی چینی ئەریستۆکرات یان گەورەزادەکان 2 (چینی) گەوران یا ئەشراف، خانەزادەکان، هەلبژاردەکان ۞ 1 اشراف‌سالاری 2 اشراف، برگزیدگان

**aristocrat** /ˈærɪstəkræt, US əˈrɪst-/ *noun*

ئەریستۆکرات، گەورەزادە، بەگزادە، سەرچین، خانەدان ۞ اشراف‌زاده

پرۆتئینەکانە ۞ اسپاراجین

**asparagus** /ɔ'spærəgəs/ *noun, pl.* same
1 (رووەکناسـی) گەولـەزەر؟، بـەنارزمی؟، مارچێوە، ترچک 2 [*Asparagus officinalis*] چوزوو یان چەکەرەی تازەی ئەم گیایە کە وەک سەوزی دەخورێ (بنەڕەت: بە ڕێگای لاتینەوە، لە *asparagos* یۆنانی) ۞ مارچوبە

**asparagus fern** *noun*
1 وەچی تازە و ناسکی گیایێ کە وەک سەوزە دەخورێ 2 فێرنی مارچێوە، ئەو وەچە دەگرێ [*Asparagus officinalis*] ۞ نوعی سرخس

**aspartame** /ə'spɑ:teɪm/ *noun*
ئاوێتـەیێکـی کریـستالی $C_{14}H_{18}N_2O_5$ (یـان شیرین کەرێکی دەسکرد)، لە aspartic acid و phenylalanine دەگیرێ ۞ نوعی سرخس

**aspartic acid** /ə'spɑ:tɪk/ *noun*
(زیندەکیمیا) ترشەلۆکی ئەسپارتیک: جۆرێ ترشەلۆکی ئەمینۆی کریستالی $C_4H_7NO_4$، لە رووەکدا دۆزراوەتەوە ۞ اسید اسپارتیک

**aspect** /'æspekt/ *noun*
1 روالـەت، نمـوود، دەموچـاو، قیافـە، سەروسەکوت، سەروتەرح، روخـار، بیچم، دیم 2 رووکـەش، رووکـار، روو، رووە، لایـەن، لا، بوار، وار، رەهەند، دۆخ، بار، رەوش 3 (ڕێزمان) ئاسپێکت (aspectual *adj*) ۞ 1 سیما، چهره، سر و وضع 2 ظاهر، وجه، منظر، رو، نما، جنبه، لحاظ، جهت، بُعد، وضع، حالت 3 (دستور زبان) نمود

**aspartic ratio** *noun*
پانایی وێنەیێ لەچاو بەرزایی یان درێژایی‌یەکەی (تەلەفزیۆن، کامپیوتێر و...) ۞ آسپکت راتیو

**aspen** /'æspən/ *noun, adjective*
*n* ویرۆل شامی، زەردەبی [*Populus tremula* (هی ئەوروپا)، *P. tremuloides* و *P. grandidentata* (ئەمریکای باکووری) و جۆرەکانی تر] *adj* 1 سەربە یان پێوەندی بە aspen ـەوە هەیە 2 (هەڵـ)دەلەرزێ یان دەلەرێتەوە وەک گەڵای aspen ۞ *n* اشنگ *adj* 1 وابسته به اشنگ 2 آسپن

**asperges** /ə'spɔ:dʒi:z/ *noun*
1 (کلێسەی کریستانیەت) سروتی پیاپرژاندنی ئاوی پیرۆز لە دەسپێکی Mass دا 2 = وشەیێکی تر بۆ aspergillum ۞ اسپرجیز

**aspergillosis** /ˌaspədʒɪ'ləʊsɪs/ *noun, pl.* aspergilloses
نەخۆشـی‌یێ بەهۆی کەڕوویێ لە توخمی *Aspergillus* ۞ آسپرژیلوز

**aspergillum** /ˌaspə'dʒɪləm/ *noun, pl.* aspergilla or aspergillums
کەرەسەیێ بۆ پیاپرژاندنی ئاوی پیرۆز ۞ اسپرجیز

**aspergillus** *noun, pl.* aspergilli
هەر کارگ یان کەڕووێکی توخمی *Aspergillus*، خێزانی ascomycetous، زۆربەی کەڕووە ئاسایی‌یەکان دەگرێتەوە ۞ اسپرژیلوس

**asperity** /æ'sperəti/ *noun, pl.* asperities
1 تونـدوتیژی، زەبروزەنـگ 2 هەڵڕووشـان، هەڵـشاخان، رووشـەیی، دڕی، تووڕەبـوون، هەڵبەزینەوە 3 جنێو 4 سەختی، دژواری 5 زۆر سـارد، شـەختەبەندان، تـۆفوبەنـد، سەرماوسەغـلەتی 6 نـارێکی، زبـری ۞ 1 خشونت 2 پرخاش، درشتی 3 فحش 4 مشقت 5 بسیار سرد 6 ناهمواری

**aspersions** /ə'spɜ:ʃnz, US ɔ'spɜ:rʒnz/ *noun, pl.*
1 تۆمەت، چەفتە، درۆ، هەڵبەستە 2 ئابڕووبردن، نێوزڕاندن، زەمکردن، خراپەوتن، سووکایەتی (پێ کردن) ۞ 1 تهمت 2 بدگویی، افترا، توهین

**aspersive** *adjective*
ئابڕووبەرانە، سووکانە ۞ توهین‌آمیز

**aspersorium** *noun, pl.* aspersoria or aspersoriums
1 قـاپی هـەڵـگرتنی ئـاوی پـیرۆز 2 = aspergillum ۞ آسپرسوریوم

**asphalt** /'æsfælt, US -fɔ:lt/ *noun, also* asphaltum
قیرڕێژ، قیل‌ڕێژ، قیرتاو، ئەسفالت (asphaltic *adj*) ۞ آسفالت

**asphalted** *adjective*
قیرڕێـژ، قیـل‌ڕێـژ، ئەسفالـت، قیرڕێژکـراو، قیرتاوکراو ۞ آسفالته

**asphaltite** *adjective*
قیری کانی یان سروشتی (خالی توانەوەکەی melting point سەرترە لە هی ئاسفالت) ۞ قیر معدنی یا طبیعی

**asphalt jungle** *noun*
دارستان یان جەنگەڵی قیرڕێژ: شارێکی گەورە یان بەشێکی تایبەتی شارێکی گەورە (وەک جێ‌یێکی پڕمەترسی و پڕململانێ) ۞ آسفالت جنگل

**aspherical** *adjective,* also aspheric
ناخڕ، ناگۆیی ۞ غیرکروی

**asphodel** /'asfədel/ *noun*
(رووەکناسـی) خـوژە، گیائەسرێلک، گوولـک، سرێشمە، گیاچرێش، گیاسرێش [*Asphodelus* و توخمە کانی تر] ۞ اسفودل، سریش

**asphyxia** /æs'fɪksiə, US ɔs'f-/ *noun*
خنکان، تاسـەنە (asphyxial *adj*؛ asphyxiant *n* :*adj*, *adj* خنکێنـەر، پشوولێبڕ *n* ماک یان مەتریالی خنکێنەر) ۞ خفگی

**asphyxiating** *adjective*
کوشـند، خنکێنـەر، پـشوولێبڕ ۞ خفقـان‌آور.

خفه‌کننده

**asphyxiation** /əsˌfɪksiˈeɪʃn/ *noun*
خنکان، تاسه‌نه، پشوولێبڕان ۞ خفگی

**aspic** /ˈæspɪk/ *noun*
1 رینگاو، ولولەی گۆشتی، ولولەی ئاوی گۆشت 2 بەرزەلنگ؟، گیاژانوویا، لاوانته ۞ 1 آسپیک 2 اسطوخودوس

**aspidistra** /ˌæspɪˈdɪstrə/ *noun, pl.* aspidistras
گەلاقەلغانی، گەلاپانکە، گەلامەتالی، ڕەسەنی ڕۆژهەلاتی ئاسیا [تـوخم *Aspidistra*] (لـه *aspis, aspid-* یۆنانی "مەتاڵ") ۞ برگ‌عبایی

**aspirant** /əˈspaɪərənt, US ˈæspərənt/ *noun, adjective*
خوازیار، تامەزرۆ، خوازیاری کار، تالب، بەپەرۆش، تینوو، تاسەمەن، هۆگر، بەهیوا ۞ داوطلب، خواهان، مشتاق

**aspirate** /ˈæspərət/ *noun*
دەنگی پیتی H ۞ صدای حرف H

**aspiration** /ˌæspəˈreɪʃn/ *noun*
1 هیوا، ئاوات، هێڤی، مەراق، ئارەزوو 2 هەلمژین، بین‌کێشان، هەناسەدان ( aspirational *adj* ) ۞ 1 آرزو، امید 2 مکیدن، استنشاق، تنفس

**aspirator** /ˈæspɪreɪtə(r)/ *noun*
(پزشکی) هەواکێش، باکێش، هەلمژە، مژمژە ۞ مکنده

**aspiratory** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە هەناسەدانەوە هەیە ۞ تنفسی

**aspirin** /ˈæsprɪn, US ˈæspərɪn/ *noun, pl.* same or aspirins
ئەسپیرین، حەبی ژانەسەر، حوبی سەرێشە (بنەڕەت: لە *acetylierte Spirsäure* ئەلمانی‌یەوە "acetylated salicylic acid") ۞ آسپیرین

**aspiring** /əˈspaɪərɪŋ/ *adjective*
بەرزخواز، بەرزەفڕ ۞ بلندپرواز

**asp viper** = asp

**asquint** /əˈskwɪnt/ *adjective, adverb*
خێل، چاولار، بە سیلەی چاو، لە یان بە گۆشەی چاوەوە ۞ لوچ

**ass**[1] /æs/ *noun*
1 کەر، گوێدرێژ [*Equus africanus* (ئەفریکا) و *E. hemionus* (ئاسیا)] 2 (نافەرمی) مرۆی گەوج و کەر 3 گایین، تێکەلبوونی سێکسی، نیاندن، نزیکی ۞ 1 خر 2 آدم ابله 3 جماع

**ass**[2] /æs/ *noun*
(زمانی ڕەمەکی ئەمریکای باکووری) کنگ، قوون ۞ کون

**assai** /aˈsʌɪ/ *noun*
(موسیقا) زۆر، یەکجار: *allegro assai* (ئیتالیایی "very much") ۞ خیلی

**assailant** /əˈseɪlənt/ *noun*
هێرش‌کەر، پەلاماردەر، هێرش‌بەر، هەلمەت‌بەر ۞ حمله‌کننده، مهاجم

**assailment** *noun*
هێرش، شالاو، هەلمەت، هورووژم ( assailable *adj* ) ۞ یورش، حمله

**Assam** *noun*
ئاسام: جۆرێ چایی، هی باکووری ڕۆژهەلاتی هیند ۞ آسام

**Assamese** /ˌasəˈmiːz/ *adjective, noun (pl. same)*
*adj* سەربە Assam، خەلکەکەی یا زمانەکەیان *n* 1 خەلکی ئاسام 2 زمانی فەرمی ئاسام، زمانێکی Indicی سەربە بەنگالی ۞ آسامی

**assart** /əˈsɑːt/ *noun*
(بریتانیا و مێژوویی) پەلەزەوی‌یێ کە لە دارستانەوە کراوەتە (یان لە دارستان بڕدراوە و کراوە بە) کێلگە ۞ آسارت

**assassin** /əˈsæsɪn, US -sn/ *noun*
1 پیاوکوژ (پیشەیی)، بکوژ، تیرۆریست، کوشتن‌کار، ڕەشەکوژ 2 (Assassin) ئەندامان یان فەدایی‌یانی حەسەنی سەباح، لە سەردەمی شەڕی خاچ‌پەرستەکاندا Crusades، حەشیشی ۞ 1 قاتل، تروریست 2 اسماعیلی

**assassination** /əˌsæsɪˈneɪʃn, US -səˈn-/ *noun*
تیرۆر، کوشتن، پیاوکوژی، ڕەشەکوژی (assassinator *n*: پیاوکوژ، مرۆکوژ، خوێنڕێژ) ۞ ترور، قتل

**assassin bug** *noun*, also reduviid
مێرووەڕەشەکوژ: جۆرێ مێرووی خوێن‌مژ یان ڕاوی لنگ‌درێژ، زۆرتر هی ناوچەی پشتێنەیی tropics، هێندێ لەوان دەتوانن نەخۆشی‌یەکان بۆ مرۆڤ ڕاگوێزن یان مشەخۆرە خوێن‌مژەکانی شیردەرانن mammals [خێزان :Reduviidae گەلێ جۆرن] ۞ نوعی حشره

**assault** /əˈsɔːlt/ *noun*
1 هێرش، هەلمەت، شالاو 2 تاوانی هێرشی جەستەیی، تێبەربوون، لێدان، لێدان و برینداركردن 3 دەس‌درێژی، پەلامار (ب.ت. سێکسی؛ assaulter *n*؛ assaultive *adj*) ۞ 1 حمله، هجوم 2 ضرب و شتم 3 تجاوز جنسی

**assault and battery** *noun*
(ماف) هێرشی جەستەیی توندوتیژانە، لێدان و بریندارکردن، پەلاماردان و بریندارکردن ۞ ضرب و شتم، ایراد ضرب و جرح

**assault course** *noun*
(سەربازی) گۆڕەپانی مەشقی سەربازی ۞ میدان تمرین نظامی

**assay** /əˈseɪ/ *noun*
1 هەلسەنگاندن، نرخاندن، قەبلاندن 2 ئەنجامی

شی کردنەوە یان شیکاری، تاکامی شیتەڵکاری 3
شــی کردنــەوە، لێکدانــەوە، شــیتەڵکــاری،
تــاقی کردنــەوە 4 دیــاری کــردنی پــەتێتی،
تاقی کردنەوە، عەیارگرتن ۞ 1 سنجش، آزمایش،
ارزیابی 2 نتیجەی تحلیل 3 تجزیە 4 عیارگیری

**ass-driver** *noun*
کەرەوان، خەرگەلە، کەرلەوەڕێن، شوانی گوێرێژ
۞ خرران

**assegai** /'æsəgaɪ/ *noun*, also asagai
1 نیزە، رم، نەیزە (لە لایەن هۆزەکانی ئەفریکای
باشــوورەوە) 2 (هــەروەهــا assegai wood)
نەیزەکە: درەختێکی ئەفریکای باشووری لە
تیرەی dogwood، کە داریکی سەختی هەیە
[Curtisia dentata] (لە *azagaie* فەرەنسی
یــان *azagai* پۆرتوگــالی، لــە *az-zaghāyah*
عــــەرەبی، لــــە *az*، *al* "the" + *zaghāyah*
بەربەری "رم") ۞ 1 نیزە 2 اساگای

**assemblage** /ə'semblɪdʒ/ *noun*
1 کۆکردنەوە، کۆبوونەوە، خڕبوونەوە، کۆمبین،
مەجلیس، جڤین، کۆمەڵە، دەستە، گەل، گروپ 2
تێکهەڵکێش کردن، سەریەکخستن، مۆنتاژ،
بەستنەوە، پێکەوەنان، سواریەک کردن ۞ 1
جمع آوری، گردهمایی، تجمع، اجتماع، جمعیت 2
مونتاژ

**assembled** *adjective*
1 کۆوەبوو، کۆوەکراو، خڕ(ەوە)کراو 2
سواریەک کراو، تێکهەڵکێش کراو،
سەریەکخراو، بەستراو، پێکەوەنراو ۞ 1
گردآمدە 2 مونتاژشدە

**assembly** /ə'sembli/ *noun*, *pl.* assemblies
1 ئەنجومەن، جڤات: *assembly elections* 2
جەرگە، کۆڕ، کۆبوونەوە، دانیشتن، کۆمبین،
گۆبەند 3 سواریەک کردن، بەستنەوە، کۆکردنەوە،
سەریەکخستن 4 تەپڵی (دەنگ) کۆکردنەوە
(سەربازەکان) ۞ 1 مجلس 2 مجمع، اجتماع،
گردهمایی 3 مونتاژ 4 شیپور جمع

**assembly language** *noun*
(کامپیوتێر) زمانی ئەسێمبلی ۞ زبان اسمبلی

**assembly line** *noun*, also production line
هێڵی بەرهەمهێنان ۞ خط تولید

**assemblyman** /ə'semblimən/ *noun*, *pl.* assemblymen
1 ئەندامی کۆمەڵە یان دەستەی قانووندانان 2
نوێنەری ئەنجومەن (لە ئەمریکا) ۞ 1 عضو
گروە قانونگذار 2 نمایندەی مجلس

**assembly room** *noun*
ژووری کۆبوونەوەکان ۞ تالار اجتماعات

**assemblywoman** /ə'semblɪwʊmən/ *noun*, *pl.* assemblywomen
1 ئەندامی کۆمەڵە یان دەستەی قانووندانان 2
نوێنەری ئەنجومەن (لە ئەمریکا) ۞ 1 عضو
گروە قانونگذار 2 نمایندەی مجلس

**assent** /ə'sent/ *noun*
1 رێککەوتن، یەککەوتن، رەزامەندی 2
پەسندکردن، مۆرکردن، پەژراندن، سەلماندن،
بەڕاستدانان ۞ 1 موافقت، رضایت 2 تأیید،
تصدیق، تصویب

**assentation** *noun*
رێککەوتن، یەککەوتن، قایلبوون ۞ موافقت

**assenter** *noun*, also assentor
رێککەوتوو، یەککەوتوو ۞ موافقت‌کنندە

**assertion** /ə'sɜːʃn, US ə'sɜːrʃn/ *noun*
1 جەختاندن، دووبارەکردنەوە، پێداگرتن،
پاگەزدان، سووربوون، پێچەقاندن 2 سەلماندن 3
دەربڕین 4 ئیدعا، داواکاری 5 بڕیار، دەستوور
۞ 1 تأکید، پافشاری 2 اثبات 3 اظهار 4 ادعا 5
حکم

**assertive** /ə'sɜːtɪv, US ə'sɜːrtɪv/ *noun*
1 لەخۆڕادیتوو، خۆباوەڕ 2 بڕا، بەزاکوون،
شێلگیر: *-sertive behaviour* 3 چاونەترس،
پێداگر، سوور 4 یەکلایی کەرەوە، کۆتایی پێهێن،
بڕێنەرەوە (assertively /ə'sɜːtɪvli, US
ə'sɜːrtɪvli/ *adv*: بە لەخۆڕادیتنەوە، قورس و
قایم، سوور؛ assertiveness *n*: 1 لەخۆڕادیتن،
بەخۆباوەڕی: *an assertiveness training
course* 2 چاونەترسی) ۞ 1 دارای اعتماد بە
نفس 2 قاطع 3 جسور، گستاخ، سمج 4 قطعی

**assertor** *noun*
داواکار، مودەعی ۞ مدعی

**assessable** *adjective*
شیاوی نرخاندن ۞ قابل ارزیابی

**assessment** /ə'sesmənt/ *noun*
1 هەڵسەنگاندن، نرخاندن، هەزیر، مەزندە 2
نرخدانان، چەسپاندنی نرخ و بایی 3 لێکدانەوە،
هەڵسەنگاندن 4 دەسنیشانکردن، دیاریکردن
(بژێرە، باج و هتد) ۞ 1 برآورد، تخمین، ارزیابی
2 قیمت‌گذاری 3 سنجش 4 تعیین

**assessment book** *noun*
نرخاندن‌نامە، دەفتەری هەڵسەنگاندن ۞ دفتر
ارزیابی

**assessor** /ə'sesə(r)/ *noun*
1 نرخێنەر، هەڵسەنگێنەر 2 یاریدەدەری
راوێژکار، دواراوێژکار (لە دادگا و لەسەر بابەتە
تکنیکییەکان) ۞ 1 ارزیاب 2 دستیار مشاور

**asset** /'æset/ *noun*
1 سامان، دارایی، ماڵ، مایە 2 خوداپێداوی،
خوداگەیاندە، نیعمەت 3 چاوگی هێز، سەرچاوە
یان ژێدەری هێز، سەرچاوەی دەسەڵات ۞ 1
دارایی، ثروت 2 نعمت 3 مصدر قدرت

**asset-stripping** *noun*
(دارایــی) هــەرزانکــڕی، مفتەکــڕی (asset-
stripper *n*) ۞ مفت‌خری

**asseveration** *noun*
چەندبارەکردنەوە، جەختکردن، سووربوون. پێداگیری، پێداگیری، پێداگرتن (بە توندی: بنەڕەت: لە *asseveratio(n-)* لاتین، لە *asseverare*، لە *ad-* "to" + *severus* "serious") ۞ تأکید، اظهار

**asshole** /'æshəul, US -houl/ = arsehole

**assibilation** *noun*
(دەنگناسی)فیشکاندن، فیکاندن ۞ صفیری‌سازی

**assiduity** /ˌæsɪ'dju:əti/ *noun, pl.* assiduities
وردەوەبوون، وردبوونەوە، سەرنج، تێکۆشان، حەولدان، خەباتکاری، شێلگیرکاری، سووربوون، بەکاری، زەحمەتکێشی، بەچنگی، ڕەنجکێشی ۞ دقت، پشتکار، جدیت

**assiduous** /ə'sɪdjuəs, US -dʒuəs/ *adjective*
1 شێلگیر، تێکۆشەر، بزاڤکار، حەولدەر، هەولدەر، بەکار، سوور، زەحمەتکێش، بەچنگ، ڕەنجکێش، بەڕشت: *one of the most assiduous members of the team* 2 بەردەوام، لەسەریەک (*assiduousness n*) ۞ 1 ساعی، سختکوش، جدی، باپشتکار 2 مستمر

**assiduously** /ə'sɪdjuəsli, US -dʒuəsli/ *adverb*
شێلگیرانە، بە سووری، بە ڕشتی: *He worked assiduously to earn the money for his son's education* ۞ پیگیرانە

**assign** = assignee

**assignable** *adjective*
لەدیاریکردنهاتوو، دیاری دەکری. لەراگوێستنهاتوو، شیاوی بەنێوکردن. لەدانەپالهاتوو، دەدرێتە پال، شیاوی خستنەپال ۞ قابل تعیین، قابل واگذاری، قابل اسناد

**assignat** *noun*
ئێسکناس (پارەیێ کە لایەن حکومەتی شۆرشگێری فەرەنسە لە سالانی 1790ـ1795 دەدرایەدەرێ) ۞ اسکناس

**assignation** /ˌæsɪg'neɪʃn/ *noun*
1 ژوان، دیاریکردنی کات 2 گواستنەوە، بەنێوکردن، کردنەناو، گوێزانەوە 3 تایبەتیدان، تەرخانکردن 4 دیاریکردن ۞ 1 میعاد 2 واگذاری 3 تخصیص 4 تعیین

**assignee** *noun*
پارێزەر، دانراو، نوێنەر، جێگر، بریکار ۞ وکیل، گماشته، نماینده

**assignment** /ə'saɪnmənt/ *noun*
1 ئەرک، کار، خەبات، ناردن بۆ کارێ، کار پێسپاردن، راسپێری، پۆست 2 (خوێندنگا) مەشق 3 تایبەتیدان، تەرخاندان 4 دانەپال، خستنەپال، پالدان 5 دانان 6 بەنێوکردن، گواستنەوە، راگوێستن، دەستلێهەلگرتن، وازلێهێنان ۞ 1 وظیفه، ماموریت، شغل 2 تکلیف، مشق 3 تخصیص 4 اسناد 5 انتصاب 6 واگذاری

**assignor** *noun*
بەنێوکەر، راگوێزەر ۞ انتقال‌دهنده

**assimilable** *adjective*
لەتوانەوەهاتوو، دەتوێتەوە، لە توانەوە دێ (*assimilability n*) ۞ قابل جذب

**assimilated** *adjective*
تواو، تووا‌و، هەرسکراو ۞ جذب‌شده

**assimilation** /əˌsɪmə'leɪʃn/ *noun*
1 تو(و)انەوە، حەلان، گرتن، مژین 2 لێکچواندن، چونیەککردن، وێکچواندن، هاوشێوەکردن، یەکسانکردن، یەکاندن، وەکیەککردن، چونیەکی 3 هەرس(کردن) 4 (دەنگناسی) هاوشێوەیی ۞ 1 جذب 2 تشبیه، همگون‌سازی، همگونی 3 گوارش 4 (آواشناسی) همگونی

**assimilator** *noun*
توێنەر، یەکێنەر، وێکچوێنەر ۞ تحلیل‌برنده، همگون‌ساز

**assimilative** *adjective,* also assimilatoty
لێکچوێنەر، یەکێنەر، یەکسانکەر ۞ همگون‌ساز

**assistance** /ə'sɪstəns/ *noun*
1 یارمەتی، یاریدە، دەسگرتن، دەسگیرۆیی، کۆمەک، باروبۆ، باربوو، بازگوری 2 ئالیکاری، هاریکاری، هاوکاری ۞ 1 کمک، امداد، کمک مالی 2 همکاری

**assistant** /ə'sɪstənt/ *noun*
1 یاریدەدەر، یارمەتیدەر، یاریەدەر، ئالیکار، یاوەر، بازگور، هاریکار 2 فرۆشیار (فرۆشگا) ۞ 1 دستیار، معاون 2 فروشنده (فروشگاه)

**assistant professor** *noun*
(لە ئەمریکا و کەنەدا) دواماموستا، یاریدەدەری ماموستا یان پرۆفسۆر ، دواپرۆفیسۆر ۞ استادیار

**assizes** /ə'saɪzɪz/ *noun*
(مێژوویی) دادگای گەڕۆک (ئینگلتەرە و ویلز) ۞ محکمەی سیار

**Assoc** *abbreviation* 1. association 2. associated

**associability** /əˌsəuʃɪə'bɪləti/ *noun*
لەبیرکەوتنەوەهاتوویی ۞ تداعی‌پذیری

**associable** /ə'səuʃɪəbl/ *adjective*
لەبیرکەوتنەوەهاتوو، دەکەوێتەوە بیر ۞ تداعی‌پذیر

**associate** /ə'səuʃiət, US ə'sou-/ *noun, adjective*
*n* 1 هاوکار، بەشدار، پشکدار، شەریک 2 یاریدەدەر 3 ئەندامی پێوەبەستراو، ئەندامی پێوەبەند *adj* 1 یەکگرتوو، هەڤگرتوو 2 بەستراو، سەربەدی، پاشکۆ، پێوەبەند، پێوەبەستراو، پێکەوەبەستراو 3 یاریدەدەری ۞ *n* 1 همکار، شریک 2 معاون 3 عضو وابسته *adj* 1 متحد 2 وابسته 3 دستیار

**Associated** /ə'səʊʃiət, -siət, US ə'soʊ-/ *adjective*
(كۆمپانیــا) پێوەبەنــد، ســـەربەدی، پاشــكۆ، پێوەبەستراو ۞ وابسته، تابعه

**associate professor** *noun*
(لـــە ئـــەمریكا و كەنـــەدا) دواماموســـتا، دواپرۆف(یـ)سۆر، یاریدەدەری پرۆفـسۆر ۞ دانش‌یار

**association** /əˌsəʊʃi'eɪʃn, -si'eɪ-, US əˌsoʊ-/ *noun*
1 بیركەوتنـەوە، پێوەنـدی هۆشـی، بەسـتنەوەی چـەمكی، هـۆش‌بەنـدی 2 گرێـدایی، پێوەنـدی، پێكبەنـدی، تێكەڵـی 3 یـەكێتی، یـەكگرتوویی 4 هاوبەشێتی، بەشداری، پشكداری 5 هەسـتان و دانیشتن، هاونشینی، هەڵس‌وكەوت 6 هاوكاری 7 كۆڕ، جڤات، ئەنجومەن، كۆمەڵە ۞ 1 تداعی 2 ارتباط، رابطه 3 اتحاد 4 مشاركت 5 معاشرت 6 همكاری 7 كانون، انجمن

**Association football** = football

**associative** /ə'səʊʃiətɪv, US ə'soʊ-/ *adjective*
1 بیركەوتنـــەوەیی، ســـەربە بیركەوتنـــەوە 2 (بیركاری) ئاسۆشەیتیڤ: $(a \times b) \times c = a \times (b \times c)$ ۞ 1 وابسته به تداعی 2 شركت‌پذیر

**associative neuron** = interneuron

**associativity** *noun*
ئاسۆشەیتیڤیتی ۞ شركت‌پذیری

**assonance** /'æsənəns/ *noun*
(دەنگ‌ناسی) هـاودەنگی، هـاوبزوێنی ۞ تـوازن، همگونی واكه‌ای

**assonant** /'æsənənt/ *adjective*
هاودەنگ، هـاوبزوێن ۞ هـم‌آوا، دارای همگـونی واكه‌ای

**assorted** /ə'sɔːtɪd, US ə'sɔːrtəd/ *adjective*
1 جۆراوجـــۆر، جۆربـــەجۆر، جەستەجەســـتە، هەمەڕەنگ، هەمەچەشنە: *The meat is served with salad or assorted vegetables* ◊ *a box of assorted chocolates* ◊ *The jumper comes in assorted colours* 2 چۆنیـەك 3 پـۆلێنراو، دەسـتەكراو، دەستەدەسـتە(كـراو)، دەسـتێنراو 4 تێكـەڵ ۞ 1 گونـاگون، متنـوع 2 متجانس 3 ردەبندی‌شده 4 مخلوط

**assortment** /ə'sɔːtmənt, US ə'sɔːrt-/ *noun*
1 كۆمەڵە، جۆرەكان، كۆمەڵـەیەكی جۆراوجـۆر یـان هەمـەڕەنگ، هەمەچەشـنە، دەسـتەجۆر، جـۆران 2 تێكەڵـە 3 پۆلانـدن، دەسـتەكردن، دەستاندن ۞ 1 مجموعه، انواع 2 آمیزه 3 ردەبندی

**Asst** *abbreviation* assistant

**assuagement** /'æsweɪdʒmənt/ *noun*
داكاسـاندن، دامركانـدن، دامرانـدن، (دا)شـكاندن، نیـشاندنەوە، هێوركردنـەوە، ئـارامكردنـەوە ۞ تسكین

**assuassive** /ə'sweɪsɪv/ *adjective, noun*
*adj* دامركێن، ژانبڕ، ئارامكەرەوە، هێدیكەرەوە *n* دەرمـانی ژانبـڕ یـان هێـدیكـەرەوە ۞ *adj* مسكن *n* داروی دردنشان

**assumable** /ə'sjuːməbl/ *adjective*
شـیاوی وادانـان، لـەوادانانهـاتوو، وادادەنـرێ (assumably /ə'sjuːməbli/ *adv*: گرتمـان، وامان‌دانا، گریمان) ۞ قابل فرض

**assumed** /ə'sjuːmd, US ə'suːmd/ *adjective*
1 سـاختە، درۆ، هەڵبەسـتە 2 وادانراو، گریمانەیی، گریمانـەكی (assumedly /ə'sjuːmdli, US ə'suːmdli/ *adv*) ۞ 1 جعلی، كاذب، دروغین 2 مفروض

**assumed name** *noun*
نێوی سـاختە، خوازەنێو، نـاوی وادانراو ۞ نـام مستعار

**assuming** /ə'sjuːmɪŋ, US ə'suːmɪŋ/ *adjective*
1 لـەخۆڕازی، لـەخۆبایی، بـەفیز، خۆهەڵـكێش، بەلاف، پڕئیدعا، خۆبەزلزان 2 گریمان، وامان‌دانا ۞ 1 پرمدعا، متكبر 2 بر فرض كه

**assumption** /ə'sʌmpʃn/ *noun*
1 وادانـان، گریمـان، وابۆچـوون، پـێ‌وابـوون، وازانـــین 2 بۆچـــوون، خـــەیاڵ، گومـــان 3 خۆبەزلزانی، بەدەماری، بەهەوایی، لەخۆبایی‌بوون 4 گرتەمل، خۆبەستەیی، دەربەستی، گرتنەئەستۆ 5 واخۆنیشان‌دان، واخۆدەرخستن 6 گرتەدەست 7 (the Assumption) 1 هەڵكـشان یـان بەرزبوونەوەی مریەم بۆ ئاسمان 2 فێستیڤاڵی 15 ئەگۆست بـۆ ئـەو یـادەوەرییـە ۞ 1 فـرض 2 پنداشت، تصور، گمان 3 غرور 4 تعهد، التزام، تقبل 5 تظاهر 6 اتخاذ 7 آسیومپـیون

**assumptive** /ə'sʌmptɪv/ *adjective*
1 وادانـراو 2 لـەخۆبایی، خۆبـەزلزان، بـەهـەوا، بەدەمار ۞ 1 مفروض 2 مغرور

**assurance** /ə'ʃʊərəns, -ʃɔːr-, US ə'ʃʊr-/ *noun*
1 لـەخۆڕادیتن، لەخۆمسۆگەربوون، خۆبـاوەڕی، لەخۆڕاپەرموون، باوەڕ بە خۆبوون، متمانە بە خۆ بوون 2 بەڵێنی، گفت 3 دڵنیایی، متمانە 4 بیمە: *a life assurance company* ۞ 1 اعتمـاد بـه نفس 2 قول 3 اطمینان 4 بیمه

**assured** /ə'ʃʊəd, ə'ʃɔːd, US ə'ʃʊrd/ *adjective*
1 دڵـــنیا، خاترجـــەم، ئەرخایـــەن 2 مـــسۆگەر، بێ‌ئەملاوئەولا: *Success seemed assured* 3 بیمەكراو 4 لەگەڵ باوەڕبەخۆبوون، خۆباوەڕانە (assuredness *n*) ۞ 1 مطمئن 2 مسلم، محرز 3 بیمه‌شده 4 با اعتماد به نفس

**the assured** *noun*
بیمەکراو ◌ بیمەگزار

**assuredly** /əˈʃʊərədli, əˈʃɔːr-, US əˈʃʊr-/ *adverb*
حەتمەن، بێ‌ئەملاوئەولا، (بە)بێ گومان. بێ‌چەندوچۆن، بەمسۆگەری‌یەوە، بەدڵنیایی، *Their attempts* :confidently ،certainly *will most -redly fail* ◌ یقیناً، حتماً، با قطعیت

**Assyrian** /əˈstatɪk/ *adjective, noun*
*adj* 1 سەربە ئاشوور Assyriaی کۆن یان زەمانەکەی 2 سەربە ئاشووری نوێ و قسەپێکەرانی *n* 1 دانیشتووی ئاشووری کۆن 2 زمانی ئەکەدی Akkadian ئاشووری کۆن 3 زاراوەی ئارامی کە ئێستا لە چەند بەشێکی سووریا و باکووری ئێراق قسەی پێ‌دەکرێ) ◌ آشوری

**Assyrian architecture** *noun*
ئارکیتیکچێری ئاشووری (وەرگیراو لە سومێری و لەسەر بنەمای تاق و گومەز، لە هەزارەی دووەمی پێش زایین‌دا) ◌ معماری آشوری

**Assyriological** *adjective*
سەربە ئاشوورناسی، پێوەندی بە ئاشوورناسی‌یەوە هەیە ◌ آشورشناختی

**Assyriologist** *noun*
ئاشوورناس، شارەزا لە ئاشوورناسی‌دا ◌ آشورشناس

**Assyriology** /əˌsɪrɪˈɒlədʒɪ/ *noun*
ئاشوورناسی، ئاسۆرناسی (دەربارەی زمان، مێژوو و هتد) ◌ آشورشناسی

**AST** *abbreviation* Atlantic Standard Time
ئەی‌ئێس‌تی، کاتی ستانداردی ئەتلانتیک (لە کەنەدا) ◌ ای‌اس‌تی

**astarboard** *adverb*
لە لای راستی کەشتی‌یەوە (ئەگەر لە دواوە چاولێکرێ): *put the helm hard astarboard* ◌ در سمت راست کشتی

**Astarte** *noun*, Latin, from Greek *Astartē*
ئەستارت (= خوای بەپیتی و خۆشەویستی (سێکسی) لای فینیکی‌یەکان Phoenician) ◌ آستارت

**astatic** /əˈstatɪk/ *adjective*
(فیزیک) ئەستاتیک، نەوێست، ناجێگیر ◌ استاتیک

**astatic equilibrium** *noun*
(کیمیا) هاوکێشی یا هاوسەنگی نەوێست (ئەستاتیک) ◌ تعادل استاتیک

**astatine** /ˈæstətiːn/ *noun*
(کیمیا) ئەستێتین، ئەستاتین، نەوێستین (بە ز.گ. 85، ن. At. لە *astatos* یۆنانی "unstable" + - ine[4]) ◌ استاتین

**aster** /ˈæstə(r):/ *noun*
گوڵەستێرە، گوڵەئاسۆ [توخم *Aster*: گەڵێ جۆرن] ◌ گل مینا

**-aster** *suffix*
پاشگر: 1 ئەستێرە، ستێر 2 شتی ئایەخ یان ناگرنگ: *poetaster* 3 (رووەک‌ناسی) ئاماژە بە لێک‌چوونێکی نیوەچڵ (دەکا): *oleaster* ◌ پسوند: 1 ستاره 2 چیز بی‌اهمیت 3 (گیاه‌شناسی) مبتنی بر هم‌سانی ناقص

**asteria** *noun*
جۆرێ بەردی بەنرخ precious stone، یاقووتەشینە ◌ استریا

**asteriated** *adjective*
تروووسکەدار، تیشکدار، بە تیشکی ئەستێرەئاساوە ◌ پرتودار

**asterisk** /ˈæstərɪsk/ *noun*
نیشانەی ئەستێرە، ئەستێرۆکە (*) ◌ علامت ستاره

**asterism** *noun*
1 نیشانەی سێ ئەستێرە (* *.* *)، کۆمەڵە ئەستێرۆکە 2 کۆمەڵە ئەستێرەیەکی چکۆلە ◌ 1 علامت سه ستاره 2 گروهی از ستارگان کوچک

**astern** /əˈstɜːn, US ɔˈstɜːrn/ *noun*
1 بەرەو پاشەوە، بەرەو پشتەوە، روو لە پشتەوە 2 بەرەو پشتەوەی کەشتی یان بەلەم، لە پشتەوەی کەشتی یا کلکی فڕۆکە ◌ 1 به سوی عقب 2 در عقب کشتی، به سوی عقب کشتی یا قایق یا هواپیما

**asteroid** /ˈæstərɔɪd/ *noun*
1 هەسارۆکە، وردەهەسارە (نێوان (خولگەکانی) بارام Mars و ورمز Jupiter 2 starfish (*adj* asteroidal: سەربە asteroid؛ لە *asteroeidēs* یۆنانی "ئەستێرەئاسا، شێوەئەستێرە"، لە *astēr* "ئەستێرە") ◌ سیارک

**asthenia** /əsˈθiːnɪə/ *noun*
بێ‌هێزی، لاوازی، نەتوانی، بێ‌گیانی، بێ‌تابشتی ◌ ضعف، ناتوانی

**asthenic** /əsˈθiːnɪk/ *adjective*
بێ‌هێز، نەتوان، لاواز، بێ‌گیان، بێ‌تابشت ◌ ضعیف، ناتوان

**asthenosphere** /əsˈθɛnəsfɪə/ *noun*
(زەوی‌ناسی) لاوازۆسفێر، چینەلاوازینە، لاوازگۆ: توێی سەرەوەی کەش یان بەرگی زەوی، لەژێر لیتۆسفێرەوە lithosphere (*adj* asthenospheric: لاوازۆسفێری، سەربە ئەستێنۆسفێر) ◌ استنوسفر

**asthma** /ˈæsmə, US ˈæzmə/ *noun*
هەناسەسواری، تەنگەهەناسە، هەناسەتەنگی، بەرهەنگ، گژم، پشووسواری ◌ تنگی نفس، آسم

**asthmatic** /æsˈmætɪk, US æzˈmætɪk/ *adjective, noun*
بەرهەنگی، هەناسەسوار، پشووسوار، توشبوو بە بەرهەنگ: *asthmatic patients* ◊ an

asthmatically ) *asthmatic attack* ۞ (/æs'mætɪkli, US æz'mætɪkli/ *adv*
وابسته به آسم، مبتلا به تنگی نفس

**astigmatic** /astɪg'matɪk/ *adjective*
لێڵبین، ئاستیگماتیک ۞ آستیگماتیک

**astigmatism** /ə'stɪgmətɪzəm/ *noun*
لێڵبینی، ئاستیگماتیزم (له -a + *stigma* یونانی "خاڵ، شوێن" + ism-) ۞ آستیگماتیسم

**astilbe** /ə'stɪlbi/ *noun*
گیایێکی چەندساڵەی زۆرتر ئاسیایی لە تیرەی saxifrage [توخم *Astilbe*] ۞ نوعی گیاه

**astir** *adverb, adjective*
1 ورووژاو، خرانە جوولە و ورووژانەوە، لە جموجۆڵدا 2 نەخەوتوو، رانەکشاو، رابوو ۞ 1 دستخوش هیجان 2 بیدار

**astonished** /ə'stɒnɪʃt, US ə'stɑːn-/ *adjective*
سەرسووڕماو، واقوڕماو، واقوڕ، تاساو، بەگیروەستاو، کاس، سەرسام: *The helicopter landed before our astonished eyes* ۞ حیرت‌زده، متعجب

**astonishing** /ə'stɒnɪʃɪŋ, US ə'stɑːn-/ *adjective*
سەرسووڕمێن، گێژکەر: *an astonishing discovery* ۞ شگفت‌آور

**astonishingly** /ə'stɒnɪʃɪŋli, US ə'stɑːn-/ *adverb*
سەرسووڕهێنەرانە ۞ به نحو شگفت‌آوری

**astonishment** /ə'stɒnɪʃmənt, US ə'stɑːn-/ *noun*
سەرسامی، سەرسووڕمان، واقوڕمان، واقوڕی، حەپەسان، عەبەسران، تاسان، بەگیروەستان، دۆشداما ن ۞ حیرت، شگفتی، بهت

**astounded** /ə'staʊndɪd/ *adjective*
سەرسووڕماو، واقوڕماو، تاساو، بەگیروەستاو، کاس، سەرسام: *an astounded expression* ۞ حیرت‌زده، متعجب

**astounding** /ə'staʊndɪŋ/ *adjective*
سەرسووڕمێن، گێژکەر، سەرسامکەر ۞ شگفت‌آور، حیرت‌انگیز

**astoundingly** /ə staʊndɪŋli/ *adverb*
سەرسووڕهێنەرانە، بەشێوەیێکی سەرسامکەر، سەرسامکەرانە، تاسێنەرانە: *There was an asrounding 20% increase in sales* ۞ به نحو شگفت‌آوری

**astr-** = astro-

**astrachan** = astrakhan

**astraddle** = astride

**Astraea** *noun*
ئەستریا (= خوای داد(پەروەری)، لە میسۆلۆژی یۆناندا) ۞ آستریا

**astragal** /'astrəg(ə)l/ *noun*
1 ئێسکی گوێزینگ، ئێسکی قولەپێ، خرتکە 2 (بیناسازی) جۆرێ گەچبڕی قۆقزی convex نیوبازنەیی، مووروون (لەسەر قەدی shaft زۆربەی ستوونە کلاسیکەکان، جگە هی یۆنانی و دۆریسی) 3 زۆپی ئاڵقەیی نزیک بە زارک و دەمی توپ 4 کەرتێکی دەربەڕیوی سەر لێواری دەرگایێکی قەدی یان دانوشتاو ۞ 1 استخوان قوزک 2، 3 و 4 استراگال

**astragalus** /ə'strag(ə)ləs/ *noun, pl.* astragali /-lʌɪ/
1 ئێسکی گوێزینگ، ئێسکی قولەپێ 2 گیای تیرەیێ کە milk vetch لەخۆدەگرێ [توخم *Astragalus*] ۞ 1 استخوان قوزک 2 نوعی گیاه

**astrakhan** /ˌæstrə'kæn, US 'æstrəkən/ *noun*
ئەستراخان (پارچە؛ بنەڕەت: لە ناوی شاری Astrakhan رووسیە هەڵگیراوەتەوە) ۞ استرخان

**astral** /'æstrəl/ *adjective*
1 ئەستێرەیی، ئەستێرەئاسا، شێوەئەستێرە، سەربە ئەستێرە: *unusual astral* ◊ *astral influences* *occurrences* 2 ئاسمانی (بنەڕەت: لە *astralis* late Latin لە *astrum* "star"; *adv* astrally) ۞ 1 ستاره‌مانند، ستاره‌ای 2 سماوی

**astrantia** /ə'strantɪə/ *noun*
گیایێ لە تیرەی parsley [توخم *Astrantia*: چەندین جۆرن] (بنەڕەت: ڕەنگە لە *astēr* یۆنانییەوە وەرگیرابێ "star") ۞ نوعی گیاه

**astray** /ə'streɪ/ *adverb, adjective*
لەرێدەرچوو، ڕێهەڵکردوو، لاداو، خڕیایی، ڕێلێتێکچوو ئاوەکی، گومڕا، سەرلێشێواو ۞ منحرف، گمراه

**astriction** /ə'strɪkʃən/ *noun*
گیری، قەبز ۞ قبض

**astrictive** /ə'strɪktɪv/ *adjective*
گیرۆک، قەبزکەر، ویکهێنە ۞ قابض

**astride** /ə'straɪd/ *adverb, preposition*
گەلاوگەڵ، لنگ‌بلاو، گەڵ‌بلاو، پێداچەقاندوو ۞ با پاهای گشاده

**astringency** /ə'strɪndʒənsi/ *noun*
قەبزبوون، قەبزێتی، گیرێتی ۞ قابضیت

**astringent** /ə'strɪndʒənt/ *noun, adjective*
*n* (دەرمان یا کریم) ویکهێنە، بەربەستکەر (خوێن) *adj* 1 تاڵ، ناخۆش، توند 2 توند، دڕ، توندوتیژ ۞ *n* منقبض‌کننده *adj* 1 گزنده 2 خشن

**astro-** /'æstrəʊ, US 'æstroʊ/ *prefix*
پێشگر: 1 ئەستێرە، ئاسمان، گەردوونی: *astrodome* 2 سەربە بۆشایی دەرەوە، وەک *astrochemistry* (بنەڕەت: لە *astron* یۆنانییەوە "star") ۞ پیشوند: 1 ستاره، آسمان، کیهانی 2 وابسته به فضای خارجی

**astro-archaeology** = archaeoastronomy

**astrobiology** *noun*

ئەستێرەزیندەناسی، ئەستروبیولۆژی ۞ ستارەزیست‌شناسی

**astrochemistry** *noun*

لێکۆڵینەی چۆنیەتی گەرد molecule و ئایۆنەکانی ئەستێرەکان و بۆشایی نێوانئەستێرەیی ۞ استروشیمی

**astrocyte** /'astrə(ʊ)sʌɪt/ *noun*

(توێکاری) ئەستێرەخانە، خانەی ئەستێرەیی ۞ یاختەی ستارەدار

**astrocytic** *adjective*

ئەستێرەخانەیی، سەربە خانەی ئەستێرەیی ۞ وابستە بە یاختەی ستارەدار

**astrodome** *noun*

1 (ئەمریکا) یاریگای گومەزی 2 پەنجێرەی گومەزی فڕۆکەیێ بۆ روانینی ئاسمان ۞ 1 استادیوم گنبدی 2 استرودوم

**astrogation** *noun*

ئەستێرەگەڕی ۞ ستارەپیمایی

**astrolabe** /'æstrəleɪb/ *noun*

ئەستێرۆلاب، ئەسترولەیب، ئەسترولاب: ئامێرێ بۆ روانین و لێکدانەوەی شوێن و هەڵکەوتی تەنە ئاسمانییەکان celestial bodies بەرلە داهاتنی sextant ۞ اسطرلاب

**astrologer** /ə'strɒlədʒə(r), US ə'strɑ:l-/ *noun*

ئەستێرەبین، ئەستێرەژمێر ۞ طالع‌بین

**astrological** /ˌæstrə'lɒdʒɪkl, US -'lɑ:dʒ-/ *adjective*, also astrologic

سەربە یان پێوەندی بە ئەستێرەبینی‌یەوە هەیە ۞ وابستە بە طالع‌بینی

**astrology** /ə'strɒlədʒi, US ə'strɑ:l-/ *noun*

1 ئەستێرەبینی، ئەستێرەژمێری 2 ئەستێرەناسی ۞ 1 طالع‌بینی 2 علم نجوم

**astrometric** *adjective*

سەربە ئەستێرپێوی، ئەستێرەپێوی‌یانە ۞ وابستە بە ستارەسنجی

**astrometry** *noun*

ئەستێرپێوی ۞ ستارەسنجی

**astron** = *abbreviation* 1 astronomer 2 astronomy

**astronaut** /'æstrənɔ:t/ *noun*

ئاسمانگەڕ، بۆشایی‌گەڕ ۞ فضانورد

**astronautical** *adjective*

سەربە ئاسمانگەڕان، سەربە بۆشایی‌گەڕان ۞ وابستە بە فضانوردان

**astronautics** *noun, pl.*

ئاسمانگەڕی، بۆشایی‌گەڕی ۞ فضانوردی

**astronomer** /ə'strɒnəmə(r), US ə'strɑ:n-/ *noun*

ئەستێرەناس، ئەستێرەوان ۞ اخترشناس، منجم

**astronomical** /ˌæstrə'nɒmɪkl, US -'nɑ:m-/ *adjective*, also astronomic

1 ئەستێرەوانی‌یانە، سەربە ئەستێرەوانی: -*onomical observations* 2 (نافەرمی) یەکجار زۆر، بەلێشاو ۞ 1 اخترشناختی 2 فوق‌العادە زیاد

**astronomical coordinnates** *noun, pl.*

پۆتان یان کۆئۆردیناتە ئەستێرەوانی‌یەکان ۞ مختصات نجومی

**astronomical horizon** *noun*

ئاسۆی ئەستێرەوانی ۞ افق نجومی

**astronomical latitude** *noun*

هێڵەپان یان پانەهێڵی ئەستێرەوانی ۞ عرض نجومی

**astronomical longitude** *noun*

هێڵەدرێژ یان درێژەهێڵی ئەستێرەوانی ۞ طول نجومی

**astronomically** /-kli/ *adverb*

لەباری ئەستێرەوانی یان ئەستێرەناسی (یەوە) ۞ از لحاظ اخترشناسی

**astronomical triangle** *noun*

سێ‌گۆشەی ئەستێرەوانی ۞ مثلث نجومی

**astronomical unit** *noun*

یەکەی ئەستێرەوانی (149.6 کیلۆمیتر، مەودایێ لە چەقی زەوی‌یەوە تا ناوەندی خۆر) ۞ واحد نجومی

**astronomical year** = solar year

**astronomy** /ə'strɒnəmi, US ə'strɑ:n-/ *noun*

ئەستێرەوانی، ئەستێرەناسی ۞ اخترشناسی، نجوم

**astrophysical** *adjective*

سەربە ئەستێرۆفیزیک یان فیزیکی ئەستێرەوانی ۞ وابستە بە اخترفیزیک

**astrophysicist** *noun*

ئەستێرۆفیزیک‌زان، فیزیک‌زانی ئەستێرەوانی ۞ اخترفیزیک‌دان

**astrophysics** /ˌæstrəʊ'fɪzɪks, US ˌæstroʊ-/ *noun, pl.*

ئەستێرۆفیزیک، فیزیکی ئەستێرەوانی ۞ اخترفیزیک

**Astro Turf** /'æstrəʊtɜ:f, US 'æstroʊtɜ:rf/ *noun*

(دروشمی بازرگانی، ئاستێکی) چیمەنی دەسکرد، بۆ وەرزش بەکاردێترێ (تێکەڵی turf + astrodome 1) ۞ آستروتورف

**astute** /ə'stju:t, US ə'stu:t/ *adjective*, also astucious

1 زیرەک، ئاگرپارە، وریا، زووتێگەیشتوو، رەند، زوورزان، زرینگ، زووزان 2 بەرژەوەندبین (astutely /ə'stju:tli, US ə'stu:tli/ *adv*: زیرەکانە، رەندانە) ۞ 1 باهوش، زرنگ، تیزفهم 2

موقع‌شناس

**astuteness** /ə'stju:tnəs, US ə'stu:tnəs/ *noun*

1 زرینگی، زیره‌کی، مدریکی، وریایی، ڕه‌ندی 2 به‌رژه‌وه‌ندبینی ۞ 1 رندی، زرنگی 2 موقع‌شناسی

**Astyanex** *noun*, Greek

ئاستیاناکس: کوڕی هێکتور و به‌رپرسی پاراستنی دیواره‌کانی ترۆی و له لایه‌ن یۆنانی‌یه‌کانه‌وه له‌و دیوارانه‌وه به‌ردراوه ۞ آستیانکس

**astylar** /ə'stʌɪlə/ *adjective*

بێ‌کۆڵه‌که، بێ‌ستوون (وه‌کوو خانووبه‌ره وهتد) ۞ آستیلار

**asunder** /ə'sʌndə(r)/ *adjective, adverb*

لێکه‌وه‌بوو، له‌به‌ریه‌ک‌هه‌ڵوه‌شاو، لێک‌بڵاوه‌بوو، په‌رش‌وبڵاوه‌بوو، لێک‌هه‌ڵته‌کاو، له‌ت‌وکوت، پارچه‌پارچه، دوو تیو، په‌راش‌په‌راش، جیا ۞ متلاشی، مجزا، تکه‌تکه

**asura** /'ʌsʊrə/ *noun*

(له دینی Vedicدا) ئاسورا: ئه‌ندامی پۆل یان ده‌سته خودایێ که له میتۆلۆژی هیندی‌دا به لای خراپی‌دا ده‌شکێته‌وه به‌لام له دینی زه‌رده‌شت‌دا Zoroastrianism (ئه‌هوورا) خودایێکی باش و چاکه‌کاره (بنه‌ڕه‌ت: سانسکریت، ڕه‌نگه له *ásu* "هه‌ناسه، ژیان") ۞ آسورا

**asylum** /ə'saɪləm/ *noun*

1 په‌نا، دالده، (سیاسی) په‌نابه‌ریتی، په‌ناخوازی: 2 *to seek/apply for/be granted asylum* شێت‌خانه، دینگه ۞ 1 پناه، پناهندگی 2 تیمارستان

**asylum right** *noun*

مافی په‌نابه‌ریتی ۞ حق پناهندگی

**asymmetric** /ˌeɪsɪ'metrɪk/ *adjective*, also asymmetrical /ˌeɪsɪ'metrɪkl/

ناهاوتا، خوار، لار، ناجووت، نالێکچوو، نابه‌رامبه‌ر ۞ نامتقارن، بی‌تقارن

**asymmetrically** /-ɪkli/ *adverb*

ناهاوتایانه، به‌شێوه‌یه‌کی ناهاوتا ۞ به طور نامتقارن

**asymmetric arrangement** *noun*

ڕیکخستنی ناهاوتا ۞ ترتیب نامتقارن

**asymmetric carbon** *noun*

(کیمیا) کاربۆنی ناهاوتا ۞ کربن بی‌تقارن

**asymmetric molecule** *noun*

(کیمیا) گه‌ردی ناهاوتا ۞ مولکول بی‌تقارن

**asymetric relations** *noun, pl.*

(کیمیا) ڕێژه ناهاوتاکان ۞ نسبت‌های نامتقارن

**asymmetric substance** *noun*

(کیمیا) ماده‌ی ناهاوتا ۞ ماده‌ی بی‌تقارن

**asymmetry** /ˌeɪ'sɪmətri/ *noun, pl.* asymmetries

ناهاوتایی، نابه‌رامبه‌ری، لێکنه‌چوویی، خواری، لاری، ناجووتی، نالێکچوویی ۞ عدم تقارن

**asymptomatic** /ˌeɪsɪmptə'mætɪk/ *adjective*

بێ‌نیشانه، بێ‌به‌رژه‌نگ، بێ‌نیشانه‌ی symptom نه‌خۆشی (asymptomatically /ˌeɪsɪmptə'mætɪkli/ *adv*) ۞ آسیمپتوماتیک

**asymptote** /'asɪm(p)təʊt/ *noun*

(بیرکاری) (هێڵ) لێک‌نزیک ۞ (خط) مجانب

**asymptotic** /ˌasɪm(p)'tɒtɪk/ *adjective*, also asymptotical

لێک‌نزیک، مه‌قارب (-ptotically /ˌasɪm(p)'tɒtɪkli/ *adv*) ۞ مجانب

**asynchronism** *noun*, also asynchrony

ناهاوکاتی، ناهاوزه‌مانی ۞ ناهم‌زمانی

**asynchronous** /eɪ'sɪŋkrənəs/ *adjective*

ناهاوکات، ناهاوزه‌مان، not synchronous ۞ ناهم‌زمان، مختلف‌الزمان

**asynchronously** /eɪ'sɪŋkrənəsli/ *adverb*

ناهاوکاتانه، به شێوه‌یێکی ناهاوکات ۞ به طور ناهم‌زمان

**asyndetic** /asɪn'detɪk/ *adjective*

سه‌ربه پچڕیتی ۞ وابسته به اسیندتون

**asyndeton** /ə'sɪndɪt(ə)n/ *noun, pl.* asyndeta /-tə/

(زمانه‌وانی) نه‌بوونی پێوه‌ندی نێوان به‌شه‌کانی ڕسته‌یێ، پچڕیتی (بنه‌ڕه‌ت: له *asundetos* یۆنانی "unconnected") ۞ اسیندتون

**at**[1] /ət, US æt/ *preposition*

1 له، ژ، تێ، به: ◊ *at the corner of the street* ◊ *We left* ◊ *They arrived late at the airport* 2 نزیک 3 له‌نێو، تێوه، له‌نێوه‌وه‌ی 2 *at 2 o'clock* 4 له‌به‌ر، له، له به‌رده‌م 5 له کاتی، له حاڵی، له دۆخی: *6 The country is now at war* 7 له به‌ره‌و، ڕووله: *He pointed a gun at her* ڕێگای، له ڕێی، به هۆی 8 کاتی، وه‌ختی 9 به خاتری: *She was delighted at the result* ۞ 1 در، به، از، با 2 نزدیک 3 توی 4 دم 5 در هنگام، در حال 6 به سوی، به طرف 7 به واسطه 8 وقت، موقع 9 به خاطر

**at**[2] /ɑ:t, US at/ *noun*

یه‌که‌ی پاره‌ی لائوس، به‌رامبه‌ر به سه‌دیه‌کی kipی ۞ ات

**Atalanta** *noun*, Latin, from Greek *Atalantē*

ئاتالانتا: ڕاوچی‌یێکی به‌پێ و گورج له میتۆلۆژی یۆنانی‌دا که داواکاره‌کانی ده‌خسته نێو پێشبڕکێوه و دواجار Hippomenes به‌سه‌ری‌دا سه‌رکه‌وت ۞ اتالانتا

**ataman** /'atəman/ *noun*

ڕێبه‌رێکی Cossack ۞ اتامان

**atamasco lily** *noun*

زه‌مبه‌قی ئاتاماسکو: ڕووه‌کێکی باشووری ڕۆژهه‌لاتی ئه‌مریکا، خێزانی amaryllis،

گولیکی زەمبەق‌ئاسای سپی تاق و جاروبار تیکەڵ بە ئەرخەوانی دەگرێ [Zephyranthes atamasco] ۞ نوعی سوسن

**ataraxia** /ˌatəˈraksɪə/ = ataraxy

**ataraxy** /ˈatəraksi/ *noun*
ئارامی دەروون، باوەڕبەخۆیی، لەسەرەخۆیی ۞ آرامش قلب

**ataractic** *noun, adjective,* also ataraxic
(دەرمانی) ئارامکەرەوە ۞ (داروی) آرام‌کننده

**atavism** /ˈætəvɪzəm/ *noun*
دەرکەوتنەوەی بۆماوەیی ۞ بازپیدایی وراثتی

**atavistic** /ˌætəˈvɪstɪk/ *adjective*
1 سەربە دەرکەوتنەوە (یام پەیدابوونەوە)ی بۆماوەیی 2 سەرەتایی، دەسپێک (atavistically /ˌætəˈvɪstɪkli/ *adv*: بە شێوەیێکی سەرەتایی یان دەسپێک؛ لەسەر بنەمای *atavus* لاتین "forefather" + پاشگری ئاوەڵناوساز *-istic*) ۞ 1 وابسته به بازپیدایی وراثتی 2 بدوی

**ataxia** /əˈtæksiə/ *noun,* also ataxy /əˈtæksi/
ناڕێکی، شێواوی (بێ‌هێزی سەبارەت بە ڕێکخستنی جوولەکانی movements ماسوولکە خۆویستەکان) ۞ بی‌نظمی

**ataxic** /əˈtæksɪk/ *adjective*
سەربە ناڕێکی، پێوەندی بە ataxia یەوە هەیە ۞ وابسته به بی‌نظمی

**ataxy** /-si/ = ataxia

**ate** /et/ US eɪt = past of eat

**-ate¹** *suffix*
پاشگر: (ناو دروست دەکا) 1 ئاماژە بە پلە، ئەرک، فەرمان، پایە، پۆست: *doctorate*، *vicarate*، *mandate* 2 ئاماژە بە کۆمەڵ و دەستەیێ: *electorate* 3 (کیمیا) ئاماژە بە خوێ یان ئێستێر، ب.ت. ترشەڵۆکێ کە کۆتایی بە *-ic* ـەوە هاتبێ (نەک بە *hydro-* دەسپێبکا: *borate*)؛ *chlorate*؛ ئاوێتەیێ کە لە ئاوێتە یان تۆخمێکی تایبەتی بەرهەم هاتووە: *phenolate* 4 ئاماژە بە بەرهەمی ڕەوت و پرۆسەیێکی کیمیایی: *condensate* 5 هەرێم، مەڵبەند، دەسەلات، میری، حکومەت: *emirate*، *khanate* 6 سەربە، پێوەندیدار، خاوەن(ی)، دار، کردن، ـئاندن، بوون، ـران، ڕێکخستن، ئامادەکردن، پێدان، دان: *activate*، *camphorate*، *insulate*، *capacitate*، *craniate* (لە *-at* فەرەنسی کۆن یان لە *-atus*، *-ata*، *-atum* لاتینەوە) ۞ پسوند: 1 وظیفه، منصب 2 اشاره به گروه 3 اشاره به نمک یا استر 4 اشاره به محصول فرایند شیمیایی 5 ایالت، دولت 6 وابسته به، کردن، شدن، مدارا کردن، ترتیب دادن، دادن

**-ate²** *suffix*
پاشگر: 1 کار و ناو دروست دەکا، وەک *associate* 2 لە لاتین ئاوەڵناو دروست دەکا: *caudate* (بنەڕەت: لە *-atus*، *-ata*، *-atum* لاتین) ۞ پسوند: فعل‌ساز و اسم‌ساز

**-ate³** *suffix*
پاشگر: کار دروست دەکا، وەک *fascinate* ۞ پسوند: فعل‌ساز

**atelectasis** /ˌatɪˈlɛktəsɪs/ *noun, pl.* atelectases
هەڵاوسانی ناتەواوی سی‌یەکان؛ گەورەبوونەوەی ناتەواوی سی‌یەکان لە هەناسەدا (وەک لە ئەنجامی نەبوونی هێزی هەناسە) ۞ آتلیکتاز

**atelectatic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە ئەتیلاکتێزەوە هەیە ۞ وابسته به آتلیکتاز

**atelier** /əˈtelɪeɪ, US ˌætlˈjeɪ/ *noun*
هونەرگە، کارگە، ئاتلیە (بنەڕەت: لە *astelle* فەرەنسی کۆن "تەڵەزمی دار") ۞ آتلیه

**atemoya** *noun*
جۆرێ میوەی گۆشتسپی گەرمێنانی داری کە متوربە یان پێوەستی sweetsop و cherimoya یە ۞ نوعی میوه

**a tempo** /ɑː ˈtɛmpəʊ/ *adverb, adjective*
(موسیقا) بەجێ، بە وەخت، لە کاتی دیاریکراودا، دەس‌پێکردنەوە یان گەڕانەوە بۆ خێرایی بنەڕەتی ۞ به موقع، بازگشت به سرعت اصلی

**atemporal** *adjective*
هەمیشەیی، تاسەر، نەمر، بێ‌کۆتایی، بەردەوام، لە لایەن کاتەوە دیاری نەکراوە یان کاری تێ‌نەکراوە ۞ ابدی، جاودانه

**a tergo** *adverb, adjective*
(لاتین) لە دواوە، لە پشتەوە، بەرەو دواوە یان پشتەوە، ڕووەو دواوە ۞ از عقب یا پشت، به سوی عقب یا پشت

**Aterian** *adjective*
سەربە یان ئاماژە بە پیشەسازی کۆنەبەردینی نیوەڕاستی Middle Palacolithic باکووری ڕۆژاوای ئەفریکا و سەحارا و شتومەک و کەلوپەلی ئەو سەروبەندە (باش شوێنەواری نموونە type site؛ بنەڕەت: لە Bir el Ater، ئەلجەزیرە + -ian) ۞ آتریَن

**Athabaskan** /ˌaθəˈbask(ə)n/ *noun, adjective,* also Athapaskan
*n* 1 خێزان یان کۆمەڵێ لە زمانە سوورپێستەکان، کە بریتین لە Navajo و Apache 2 قسەپێکەری هەریەک لەو زمانانە *adj* سەربەو زمانانە (لە *Athabasca* ناوی گۆماوێ لە ڕۆژاوای کەنەدا + -an) ۞ آتاباسکان

**athanor** /ˈaθənɔː/ *noun*
(مێژوویی) تەنوورە، جۆرێ کوورەی کیمیاگەران، کڵ (بنەڕەت: لە *at-tannūr* ی عەرەبی وەرگیراوە) ۞ آتانور

**atheism** /ˈeɪθiɪzəm/ *noun*

بێ‌دینی، دیندڕی، لادینی، بێ‌خودایی، زەندیقی، ناخوداباوەڕی ۞ الحاد

**atheist** /'eɪθiɪst/ *noun*
بێ‌دین، دیندڕ، لادین، ناخوداباوەڕ، بێ‌خودا، زەندیق، مارس ۞ ملحد

**atheistic** /ˌeɪθi'ɪstɪk/ *adjective*, also atheistical
سەربە بێ‌دینی، بێ‌خوداباوەڕی، ناخوداباوەڕی‌یانە ۞ الحادی

**atheling** /'aθ(ə)lɪŋ/ *noun*
میر یان لۆردێ لە ئینگلتەرەی ئانگلۆساکسۆنی‌دا ۞ آتلینگ

**athematic** /ˌaθɪ'matɪk, US ˌeɪ-/ *adjective*
1 (ڕێزمان) نابنەیی، ناقەدی 2 (موسیقا) نابابەتی ۞ 1 (دستور زبان) ناستاکی 2 (موسیقی) غیرموضوعی

**Athena** *noun*, also Athene, Latin Athena, from Greek *Athēnē*
ئەسینا، ئاتینا (خواژنی ژیری و زانایی یونانی، بڕوانە Minerva) ۞ آتنا

**athenaeum** /ˌaθɪ'niːəm/ *noun*, US atheneum
1 کۆڕی زانستی یا ویژەیی 2 ژووری خوێندنەوە (لە *Athēnaion* یونانی: ئاماژە بە پەرستگەی Athena) ۞ 1 انجمن علمی یا ادبی 2 اتاق مطالعه

**Athene** = Athena

**Athenian** *noun, adjective*
*n* خەڵکی ئاتین یان ئەسینا، ئاتینی *adj* سەربە ئەوێ ۞ آتنی

**atherosclerosis** /ˌaθərəʊsklɪə'rəʊsɪs, US -sklə-/ *noun*
ڕەقبوونی شارەگ یان شادەمار، (شا)رەگەرەقی ۞ تصلب شریان

**atherosclerotic** *adjective*
سەربە یا پێوەندی بە atherosclerosis هەیە ۞ وابسته به تصلب شریان

**athirst** /ə'θɜːst/ *noun*
1 (کۆن) تینوو، thirsty 2 بەپەرۆش، بەتین، تامەزرۆ، بەتاسە، eager ۞ 1 تشنه 2 مشتاق

**athlete** /'æθliːt/ *noun*
1 وەرزشەوان، وەرزشکار 2 قارەمان، پاڵەوان (بنەڕەت: لە *athleta* لاتین، لە *athlētēs* یونانی، لە *athlein* "پێش‌برکێ بۆ خەڵاتێ compete for a prize"، لە *athlon* "خەڵات prize") ۞ 1 ورزشکار 2 قهرمان

**athlete's foot** *noun*, also tinea pedis
نەخۆشی قارچکی پا یان قامکەکانی پێ ۞ بیماری قارچی پا

**athletic** /æθ'letɪk/ *adjective*
1 وەرزشی 2 قارەمانی، پاڵەوانی 3 بەهێز، بەتابشت، ڕێکوپێک 4 چالاک ( athletically /-ɪkli/ *adv*: لەباری وەرزشی‌یەوە) ۞ 1 ورزشی 2 قهرمانی 3 قوی، نیرومند، خوش‌بنیه 4 فعال

**athletics** /æθ'letɪks/ *noun, pl.*
1 وەرزش 2 یاری‌یە وەرزشی‌یەکان ۞ 1 ورزش 2 بازی‌های ورزشی

**athletic shoe** = tennis shoe

**athletic supporter** = jockstrap

**at-home** *noun*
میوانداری (لەماڵی خۆ) ۞ پذیرایی

**athwart** /ə'θwɔːt/ *adverb, preposition*
1 لە پانایی‌یەوە، لەمبەر بۆ ئەوبەر، لە لایەکەوە بۆ لایەکی تر، across: *They put a table athwart the doorway* 2 دژ: *His statement ran athwart what was previously said* ۞ 1 از عرض 2 مخالف

**-ation** *suffix*
پاشگر: کار، کردەوە، کریار، کردار، کردە، دۆخ، بار، ئەنجامی کار، کارەنجام: *exploration* (بنەڕەت: لە *-ation* فەرەنسی یا *-ation-* لاتین) ۞ پسوند: عمل، عملیات، حالت، نتیجه‌ی عمل

**atishoo** /ə'tɪʃuː/ *interjection*
ئەپش، دەنگی پشمین ۞ آپیشه

**-ative** *suffix*
پاشگر: سەربە، پێوەندی هەیە بە، ـکار، ـکەر، کەرەوە، ـی‌یانە، ـانە، خوازیار بە کردنی شتێ، پێخۆش‌بوو بە: *pejorative* (بنەڕەت: لە *-atif*، *-ative* فەرەنسی یان *-ativus* لاتین) ۞ پسوند: وابسته به، متمایل به

**Atlantean** *adjective*
سەربە دوورگەی ئەفسانەیی Atlantis ۞ اتلانتیک

**atlantes** = plural form of atlas3

**Atlantic** *adjective*
1 سەربە یان نزیک بە ئۆقیانووسی ئەتلانتیک 2 (زەوی‌ناسی) سەربە سێیەمین قۆناخی ئاووهەوایی سەردەمی پاش‌سەهۆڵبەندان postglacial لە ئەورووپای باکووری‌دا (دەوروبەری 7500 تا 5000 ساڵ لەمەوپێش، بە ئاووهەوایەکی ئۆقیانووسی تەڕوتووشەوە، لەناوی کێوی Atlas لە لیبیا هەڵگیراوەتەوە، لە بنەڕەتا ئاماژە بە چیای Atlas لە لیبیا دەکا) ۞ اتلانتیک

**Atlantic Ocean** *noun*, geographical name
ئۆقیانووسی ئەتلانتیک، ئۆقیانووسی ئەتلەس (82,399,918 کیلۆمیتری چوارگۆشە (31,814,640 مایلی چوارگۆشە)، زۆرتر بۆ South Atlantic و North Atlantic Ocean دابەش دەکرێ) ۞ اقیانوس اطلس

**Atlanticism** /at'lantɪˌsɪz(ə)m/ *noun*
باوەڕێ لەسەر بنچینەی پێوەندی نزیکی نێوان ڕۆژاوای ئەورووپا و ئەمریکا، ب.ت. لە ناتۆدا ۞ آتلانتیسم

**Atlanticist** /at'lantɪˌsɪst/ *noun, adjective*

*n* ئاتلانتیسـت *adj* ئاتلانتیسـتی ◌ *n* آتلانتیسـت *adj* آتلانتیسـتی

**atlas** /'ætləs/ *noun*, Latin *Atlant-*, *Atlas*, from Greek

1 a: (Atlas) تایتانێ کە لە لایەن زیوسـەوە سزا درا بە راگرتنی پایەکانی جیهان یان ئاسمان لەسەر شانی. b: کەسێ کە ئەرکی قورسی لەسەر شانە، پشتیوان، پاڵپشت، 2 mainstay ئەتلەس، نەخشـەنامە 3 (تویکاری) سـەرترین بڕبڕەی پشت، سەربڕبڕە، سەرمۆرە، یەکەمین بڕگە یان مۆرەی مل 4 (/atlantes /at'lanti:z مێعماری) کۆڵەکە یان ستوونی پالەوانە یان پالەوانپەیکەر (هەروەها telamon) ◌ اطلس

**atlas moth** *noun*

جۆرێ پەروانەی شەوگەری زۆر زلە [ *Attacus atlas*] ◌ نوعی شب‌پره

**atlatl** *noun*

ئەتلاتل (کەرەسەیێ بۆ هاویشتنی نێزە یان تیر کە لە میل و تەختە و شتێکی وەک قولاپ پێکهاتووە، لە *ahtlatl* ی Nahuatl) ◌ اتلاتل

**Atli** *noun*

ئاتلی: پادشای هونەکان Hun، هاوتای Attila مێژوویی‌یە ◌ آتلی

**ATM** /ˌeɪ tiː 'em/ *abbreviation* automated teller machine

دەزگای سنووقی خۆکار یا ئۆتوماتیک ◌ ای‌تی‌ام

**atman** /'ɑːtmən/ *noun*

1 (هیندوئیزم) بنەمای ژیانی مانایی گەردوون 2 گیانی مرۆڤ (بنەڕەت: لە *ātman* سانسکریتی: "essence") ◌ 1 اتمان 2 روح انسان

**ATM card** = cash card

**atmo-** *prefix*

پێشگر: هولم، هەلم، بوخ (بنەڕەت: لە *atmos* یۆنانی‌یەوە) ◌ پیشوند: بخار

**atmommeter** *noun*

هولمپێو، هەلمپێو ◌ بخارسنج

**atmosphere** /'ætməsfɪə(r), US -fɪr/ *noun*

کەش، تەوشک، هەوا، کەش‌وهەوا، هەلمەگۆ، چینەهەلمینە (بنەڕەت: لە *atmosphaera* لاتینی نوێ، لە *atmos* یۆنانی "هەلم vapour" + *sphaira* "گۆ globe") ◌ جو، هوا، حال و هوا

**atmosphere layers** *noun, pl.*

(جوگرافیا) چینە کەشی‌یەکان، تـوێژە کەشی‌یەکان، چین‌وتوێژی کەش ◌ لایه‌های جو

**atmospheric** /ˌætməs'ferɪk/ *adjective*, also atmospherical

کەشی، سەربە کەش، هەلمەگۆیی ◌ جوی، وابسته به جو

**atmospherical unit** *noun*

یەکەی (گوشار یا پەستان) کەشی ◌ واحدجوی

**atmospheric dust** *noun*

(جوگرافیا) تۆزی کەشی ◌ غبار جوی

**atmospheric pressure** *noun*

گوشار یان پەستانی کەشی ◌ فشار جوی

**atmospheric refraction** *noun*

(جوگرافیا) شکانەوەی کەشی ◌ شکست جوی

**atmospherics** /ˌætməs'ferɪks, US -'fɪr-/ *noun, pl.*

پاڕازیت، خشەخش: ئەو دیاردە ئێلیکتریکی‌یانە کە دەبنە هۆی ئەم تێکچوون و شێوانانە ◌ پارازیت

**atoll** /'ætɒl, US 'ætɔːl, -tɑːl/ *noun*

دوورگەی شیلانی، شیلانەدوورگە، شیلانی بازنەیی (یان زنجیرەیێ لە دوورگەکان کە لە شیلان coral پێکهاتوون) ◌ آبسنگ حلقوی

**atom** /'ætəm/ *noun*

1 گەردیلە، ئەتۆم 2 تۆزە، کەمووسکە، نەختە (بنەڕەت: لە *atome* فەرەنسی کۆن، لە ڕێگای لاتین، لە *atomos* یۆنانی‌یەوە "indivisible"، لەسەر بنچینەی -*a* "نە، نا" + *temnein* "بڕین") ◌ 1 اتم، جزء لایتجزا، ذره 2 چکه

**atom bomb** = atomic bomb

**atomic** /ə'tɒmɪk, US ə'tɑːmɪk/ *adjective*

گەردیلەیی، ناوکی، ئەتۆمی ◌ اتمی، هسته‌ای

**atomic age** *noun*

سەردەمی گەردیلەیی یا ئەتۆمی ◌ دوره‌ی اتمی

**atomic bomb** *noun*, also atom bomb

بۆمبی گەردیلەیی یان ئەتۆمی ◌ بمب اتمی

**atomic clock** *noun*

سەعاتی گەردیلەیی یان ئەتۆمی ◌ ساعت اتمی

**atomic crystal** *noun*

(کیمیا) کریستالی گەردیلەیی، بلووری ئەتۆمی ◌ بلور اتمی

**atomic energy** *noun*

وزەی گەردیلەیی یان ئەتۆمی، وزەی ناوکی ◌ انرژی اتمی

**atomic fusion** *noun*

پێکالکانی گەردیلەیی، پێکەوەنووسانی ئەتۆمی ◌ هم‌جوشی اتمی

**atomic heat** *noun*

گەرمی گەردیلەیی یان ئەتۆمی ◌ حرارت اتمی

**atomic interaction** *noun*

(کیمیا) کارلێکی گەردیلەیی یان ئەتۆمی ◌ برهم‌کنش اتمی

**atomicity** *noun*

(کیمیا) ژمارەی گەردیلەکانی نێو گەردی توخمێ ◌ اتومیسیتی

**atomic lattice** *noun*

(کیمیا) تۆڕی گەردیلەیی یان ئەتۆمی ◌ شبکه‌ی اتمی

**atomic mass** *noun*

(کیمیا) بارستەی گەردیلەیی یان ئەتۆمی ◌

جرم اتمی
**atomic mass unit** *noun*
(کیمیا) یەکەی بارستەی گەردیلەیی ۞ واحد جرم اتمی
**atomic number** *noun*
ژمارەی گەردیلەیی یان ئەتۆمی ۞ عدد اتمی
**atomic orbital** *noun*
(کیمیا) خولگەی گەردیلەیی یان ئەتۆمی ۞ اوربیتال اتمی
**atomic physics** = nuclear physics
**atomic radius** *noun*
(کیمیا) نیوەتیر یان لاتیرەی گەردیلەیی یان ئەتۆمی ۞ شعاع اتمی
**atomic reactor** = nuclear reactor
**atomics** *noun. pl.*
گەردیلان، لقێ لە فیزیکی ناوکی ۞ اتومیکس
**atomic size** *noun*
(کیمیا) ئەندازە یان قەبارەی گەردیلەیی ۞ اندازەی اتمی
**atomic structure** *noun*
(کیمیا) پێکهاتەی گەردیلەیی یان ئەتۆمی ۞ ساختار اتمی
**atomic theory** *noun*
تیۆری گەردیلەیی، بیردۆزی ئەتۆمی ۞ نظریەی اتمی
**atomic warhead** = nuclear warhead
**atomic weight** *noun*
(کیمیا) کێشی گەردیلەیی یان ئەتۆمی ۞ وزن اتمی
**atomism** /ˈætəmɪzəm/ *noun*
1 گەردیلەباوەری، ئەتۆمباوەری (بیرۆکەی شی کردنەوەی شتێ بە جیاکردنەوە و بەش بەش کردنی 2 دژی holism) ۞ اتمگرایی
**atomist** /ˈætəmɪst/ *noun*
گەردیلەباوەر، ئەتۆمباوەر ۞ اتمگرا
**atomistic** /ˌætəˈmɪstɪk/ *adjective*
گەردیلەباوەرانە، سەربە گەردیلەباوەری ۞ اتمگرایانە
**atomistics** *noun. pl.*
زانستی گەردیلە، گەردیلەناسی، ئەتۆمناسی ۞ علم اتم
**atomization** *noun*
1 گەردیلاندن، ئەتۆماندن 2 لێک هەڵوەشاندن، شی کردنەوە، پارچەپارچەکردن ۞ 1 تبدیل بە اتم کردن 2 تجزیە
**atomizer** /ˈætəmaɪzə(r)/ *noun*
پرژێنە، گوڵاوپرژێن ۞ اسپری
**atomy** /ˈatəmi/ *noun, pl.* atomies
1 چوارچێوە یا ئێسکبەستی مرۆڤ 2 گەردیلە ۞ 1 اسکلت انسان 2 اتم
**atonal** /eɪˈtəʊnl, US eɪˈtoʊnl/ *adjective*
(موسیقا) ئێی‌تۆناڵ، ئەتۆناڵ (لە هیچ کلیلێکی تایبەتیدا نەنووسرابێ)، بێ‌تۆناڵ ۞ آتونال
**atonality** /ˌeɪtəʊˈnæləti, US ˌeɪtoʊˈn-/ *noun*
ئێی‌تۆنالیتی، بێ‌تۆنالیتی، ئەتۆنالیتە ۞ آتونالیتە
**atonement** *noun*
1 تۆڵەکردنەوە، زیان‌دانەوە، قەرەبووکردنەوە 2 کەفارە(ت)، تاوان‌دانەوە، تاوانپۆشی 3 زیان، زیانە، بژارە، بۆبژاردن 4 (the Atonement) تاوان‌دانەوەی مەسیح (بۆ سڕانەوەی گوناهی مرۆڤ) ۞ 1 جبران 2 کفارە 3 خسارت، تاوان، غرامت 4 اتونمنت
**atonic** /eɪˈtɒnɪk, US -ˈtɑːn-/ *adjective*
1 لاواز، بێ‌هێز، کز 2 (زمانەوانی) بێ‌زەبر 3 (پیتی) بێ‌دەنگ یان کپ ۞ 1 ضعیف 2 بی‌تکیە 3 بی‌صدا
**atony** /ˈatəni/ *noun,* also atonia
1 لاوازی، بێ‌هێزی 2 بێ‌زەبری ۞ 1 ضعف 2 فقدان تکیە
**atop** /əˈtɒp, US əˈtɑːp/ *preposition*
لەسەر، لەژوور، لەبان، لەسەرووی: *a flag high atop a pole* ۞ بالای، بر روی
**atopic** /eɪˈtɒpɪk/ *adjective*
ناشوێن، ناجێ؟: ئاماژە بە جۆرێ پێنەکەوتەیی یان ئالێرژی (لەوە دەچێ بۆماوەیی بێ) کە نیشانەکانی بریتین لە هەناسەسواری، بیرۆ hives و لیرگ hay fever، پووشەتا eczema (خرکانە atopic dermatitis؟ بنەڕەت: لە *atopia* یۆنانی "unusualness"، لە *-a* + *topos* "شوێن") ۞ اتوپیک
**atopy** /ˈatəpi/ *noun*
ناشوێنی، ناجێیی ۞ اتوپی
**-ator** *suffix*
پاشگر: کارا، بکەر، کار، چی، کەر، گێر، سەر: *agitator* (لە لاتینەوە) ۞ پسوند: فاعل، کنندە
**-atory** = -ory
**ATP** *abbreviation* (Biochemistry) adenosine triphosphate 2 (Brit.) automatic train protection
**atrabilious** /ˌatrəˈbɪlɪəs/ *adjective*
(وێژەیی) مالیخولیایی (atrabiliousness *n*) ۞ سودایی
**atrazine** /ˈatrəziːn/ *noun*
ناوێتەیێکی کریستاڵی سپی $C_8H_{14}C_lN_5$، لە تریازین دادەڕێژرێ و وەک بژارکوژ بەکاردێترێ (ب.ت. بەروبوو و بەرهەمی گەنمەشامی یان quack grass؛ بنەڕەت: تێکەڵەی *amino* + triazine) ۞ اترازین
**atresia** /əˈtriːʃə, US -zɪə/ *noun*
1 (پزشکی) کونەتەسکی، نەبوون یان تەنگ‌بوونەوەی نائاسایی کونێکی لەش 2

(کارئەندامناسی) داوەشانی ئەو Graafian follicle انە کە بە درێژایی سووڕی بێنوێژی هێلکۆکە دانانێ ◌ اترسیا

**Atreus** *noun*, Greek
ئاتروس، ئاتریۆس: پادشای مایسینا Mycenae و باوکی ئاگامێمنۆن Agamemnon و مێنیلاوس Menelaus ◌ آتروس

**atrial** *adjective*
(توێکاری) گوێچکەلەیی ◌ دهلیزی

**atrial natriuretic factor** *noun*, *abbreviation* ANF
هۆرمۆنێکی ماسوولکە گوێچکەلەیییەکانی دڵ کە یاریدەی میزانکردنی پەستانی خوێن و هاوسەنگی electrolyte دەدا ◌ نوعی هورمون

**atrial septum** *noun*
دیوار(ە) یان پەرە یان کۆڵەکەی گوێچکەلەیی ◌ تیغەی دهلیزی

**atrichous** *adjective*
بێموو، بێپرچ ◌ بدون مو

**atrioventricular** /ˌeɪtrɪə(ʊ)venˈtrɪkjʊlə/ *adjective*, *abbreviation* AV, A-V
(توێکاری و کارئەندامناسی) گوێچکەلەیی و سکۆڵەیی، گوێچکەلە(و)سکۆڵەیی، سەربە یان پێوەندی بە گوێچکەلە و زگۆڵەی دڵەوە هەیە ◌ دهلیزی و بطنی، دهلیزیبطنی

**atrioventricular bundle** *noun*, also bundle of His
چەپکەی گوێچکەلەیی و سکۆڵەیی یان گوێچکەلە(و)سکۆڵەیی ◌ اتریوونتریکیولار باندل

**atrioventricular canal** *noun*
کاناڵی گوێچکەلەیی و سکۆڵەیی یان گوێچکەلە(و)سکۆڵەیی ◌ اتریوونتریکیولار کانال، کانال دهلیزیبطنی

**atrioventricular node** *noun*
گرێی گوێچکەلەیی و سکۆڵەیی یان گوێچکەلە(و)سکۆڵەیی ◌ اتریوونتریکیولار نود

**atrioventricular valve** *noun*
زمانەی گوێچکەلەیی و سکۆڵەیی یان گوێچکەلە(و)سکۆڵەیی ◌ دریچەی دهلیزیبطنی، اتریوونتریکیولار نود

**atrium** /ˈeɪtriəm/ *noun*, *pl.* atria /ˈeɪtrɪə/ or atriums
1 (توێکاری) گوێچکەلە 2 داڵان 3 دیو یان حەوشەی نێوەڕاستی خانووی ڕۆمی کۆن 4 پێشخانە یان حەوشەی نێوەڕاست لە خانووی ئێستادا (بنەڕەت: لە لاتینەوە) ◌ 1 و 2 دهلیز 3 و 4 آتریوم

**atrocious** /əˈtrəʊʃəs, US əˈtroʊ-/ *adjective*
1 بێبەزەییانە، بێشەرمانە، زاڵمانە، درندانە، ترسناک، شێرزە، ترسێنەر، توقێنەر، زۆرناخۆش 2 یەکجار خراپ، پیس، شێرزە ◌ 1 بیرحمانە، فجیع، وحشتناک 2 افتضاح

**atrociously** /əˈtrəʊʃəsli, US ɔˈtroʊ-/ *adverb*
بێبەزەییانە، زاڵمانە، درندانە، دڵڕەقانە ◌ (بە طور) بیرحمانە

**atrociousness** /əˈtrəʊʃəsnəs, US əˈtroʊ-/ *noun*
بێبەزەییێتی، درندەیی، ترسناکی ◌ بیرحمی، وحشتناک بودن

**atrocity** /əˈtrɒsəti, US əˈtrɑːs-/ *noun*, *pl.* atrocities
1 بێبەزەییێتی، هۆڤێگەری، دڵڕەقی، درندەیی، خوێنڕێژی، زەبروزەنگ، توندوتیژی 2 کردەوەی درندانە ◌ 1 بیرحمی، سبعیت، خشونت 2 عمل وحشیانە

**atrophic** /əˈtrɒfɪk/ *adjective*
پووکاو، وشکهەڵگەڕاو، پێچوو، وشکهەڵاتوو ◌ تحلیلرفتە، پلاسیدە

**atrophied** *adjective*
پووکاو، وشکهەڵگەڕاو، رزیو، پێچوو، وشکهەڵاتوو، وشکەڵاتوو ◌ تحلیلرفتە، پلاسیدە

**atrophy** /ˈætrəfi/ *noun*, *pl.* atrophies
1 پووکانەوە، وشکهەڵگەڕان، رزین، پێچوون، وشکهەڵاتن 2 (خوازە) داچوون، پووکانەوە (بنەڕەت: لە *atrophier* (کار verb)، *atrophie* (ناو) فەرەنسی، لە late Latin *atrophia*، لە یۆنانییەوە "نەبوونی خۆراک") ◌ 1 پلاسیدگی 2 (مجازی) انحطاط

**atropin** /ˈatrəpiːn, US -ɪn/ *noun*, also atropine
(کیمیا) ئاترۆپین (ناوێتەیەکی ژاراوی کە لە deadly nightshade دۆزراوەتەوە و لە پزشکیدا وەک هێورکەرەوەی ماسوولکەکان بەکاردێت؛ بنەڕەت: لە ناوی یەکێ لە Fate ەکان + ine) ◌ آتروپین

**atropism** *noun*
ئاترۆپیزم، ژاراویبوون بە ئاترۆپین ◌ آتروپیسم

**Atropos** *noun*
ئاترۆپۆس: ناوی یەکێ لە سێ خواژنی چارەنووس Fates ◌ آتروپوس

**at sign** *noun*
نیشانەی @ ◌ علامت @

**attachable** /əˈtætʃəbəl/ *adjective*
شیاوی دەسبەسەراگرتن، لەگرتنهاتوو، دەگیرێ، دەسیبەسەرا دەگیرێ ◌ قابل توقیف

**attaché** /əˈtæʃeɪ, US ˌætəˈʃeɪ/ *noun*
(فەرەنسی) دەتەشێ، بەرپرسە (باڵیۆزخانە، بەرپرسە بۆ بوارێکی تایبەتی) ◌ وابستە

**attaché case** *noun*

ساک، کیف، جانتا (دیپلۆمات) ۞ کیف

**attached** /ə'tætʃt/ *adjective*

1 سەوداسەر، دلبەستە 2 پاشکۆ، پالخستە، لکاو، چەسپیو، پێوەلکاو، نووساو، یەک گرتوو، یەک گیر، پێوەنراو، پێکەوەبەستراو، پەیوەست 3 پێوەندیدار، بەنیوار، بەیەکەوەگرێدراو ۞ 1 شیفتە، دلبستە 2 ضمیمە، متصل 3 مربوط

**attachment** /ə'tætʃmənt/ *noun*

1 خۆشەویستی، هۆگری، دلبەستەیی، سەوداسەری 2 لکان، نووسان، چوونەپاڵ، پێوەنووسان، چەسپان، گرتن، پێوەلکاندن، پێکەوەبەستن، چەسپاندن، پاڵخستن، دانەدەم، لکاندن، پێوەنان، لێدان 3 پاشکۆ، سەرخستە، پالخستە 4 پێوەندی 5 گرتن، گلدانەوە، دەس‌بەسەراگرتن، زەوت کردن 6 ناردن بۆ جێگایێ، راسپێری ۞ 1 دلبستگی، علاقە 2 اتصال، الحاق 3 ضمیمە، پیوست 4 ارتباط 5 توقیف، ضبط 5 مأموریت

**attack** /ə'tæk/ *noun*

1 هێرش، هەلمەت، شالاو، گوژمە، نهێو، پەلامار 2 دەسپێک، دەس‌پێکردن، سەرەتا 3 دەس‌تێدان ۞ 1 حملە 2 آغاز 3 مبادرت

**attacker** /ə'tækə(r)/ *noun*

هێرش‌بەر، پەلاماردەر ۞ حملەکنندە

**attainability** /əˌteɪnə'bɪlətɪ/ *noun,* also attainableness

لەپێگەیشتن‌هاتوویی، لەدەس‌خستن‌هاتوویی، بەدەس‌هێنراوی ۞ قابلیت حصول

**attainable** /ə'teɪnəbl/ *adjective*

لەپێگەیشتن‌هاتوو، گیرکەوتوو، بەدەس‌هێنراو، بە دەس دێنرێ، بە دەس دەکەوێ، لەدەس‌خستن‌هاتوو: *attainable goals /targets* ۞ قابل حصول

**attainder** /ə'teɪndə/ *noun*

1 بێ‌بەر(کردن)ی لە مافە شارستانی و کۆمەڵایەتی‌یەکان (لەبەر ناپامی یان تاوان) 2 رووڕەشی، بێ‌ئابڕوویی، نەنگ ۞ 1 محرومیت از حقوق مدنی یا اجتماعی 2 ننگ

**attainment** /ə'teɪnmənt/ *noun*

1 بەدەس‌هێنان، گیرخستن، دەس‌خستن، گەیشتن، پێگەیشتن 2 سەرکەوتن، پێشکەوتن 3 دەسکەوت، بەرهەم 4 هونەر، شارەزایی ۞ 1 دستیابی، حصول 2 موفقیت، پیشرفت 3 دستاورد 4 فن، مهارت

**attaint** *noun*

1 (کۆن) پەڵە، نەنگ، لکەی نەنگ، عەیب، شوورەیی، بەدناوی، بێ‌ئابڕوویی، ناوزڕاوی 2 مەحکووم‌بوونی دادگەر یان ئەندامی دەستەی سوێندخۆران بەهۆی دانی بڕیارێکی هەڵەوە 3 برینی پێی ئەسپ، زامی لاقی ئەسپ ۞ 1 لکەی ننگ، بدنامی 2 اتینت 3 زخم پای اسب

**Attalid** /'atəlɪd/ *noun*

ئەتالوسی: ئەندامی بەرەیێکی هێلێنیستی، لە ناوی Attalus یەکەم (ماوەی دەسەڵات 241-197 پێش زایین) هەڵگیراوەتەوە کە لە سەدەکانی سێهەم و دووهەمی بەرلە زایین گەشەی سەند ۞ آتالوسی

**attar** /'ætə(r)/ *noun,* also otto

گولاو، عەتری گول (بنەڕەت: لە *'iṭr* ی عەرەبی‌یەوە) ۞ عطر گل

**attempt** /ə'tempt/ *noun*

1 خەبات، هەول، حەول، تێکۆشان، بزاف، هەولدان: *They made no attempt to escape* 2 دەس‌تێدان، دەس‌دان 3 هەولدان بۆ کوشتن، حەولی کوشتن، بەدنیازی، حەولدان بۆ کوشتنی کەسێ: *an assassination/murder attempt* 4 جار، کەڕەت، کەشە، کەڕەت، چەل ۞ 1 کوشش، تلاش، مجاهدت 2 مبادرت 3 سوءقصد 4 دفعە، بار

**attempted** /ə'temptɪd/ *adjective*

سەرنەکەوتوو، سەرنەگرتوو، جێبەجێ‌نەبوو: *We were shocked by his attempted suicide* ◊ *attempted rape/murder/robbery* ۞ نافرجام

**attempted murder** *noun*

هەولی کوشتنی سەرنەگرتوو، حەولی دەس‌درێژکەرانەی سەرنەکەوتوو ۞ سوءقصد نافرجام

**attendance** /ə'tendəns/ *noun*

1 هاتن، ئامادەبوون، هاتووان، ئامادەبووان، لێرەبووان 2 لێرەبوون، خزمەت کردن، چاولێ‌وەبوون، ئاگاداری، چاودێری، ئاگالێ‌بوون، بەدیارەوەبوون، پێ‌ڕاگەیشتن، بەلاوەبوون 3 لەگەڵبوون 4 خزمەت، راژە ۞ 1 حضور، حضار 2 مراقبت، پرستاری، رسیدگی 3 ملازمت 4 خدمت

**attendant** /ə'tendənt/ *noun, adjective*

1 ئامادە، هاتوو 2 هاوڕێ، لەگەڵ 3 بەرپرس، چاوبەسەرەوەبوو، چاودێر 4 نۆکەر، بەردەست، خزمەت‌کار، راژەوان 5 لە ئەنجامی، لێکەوتوو لە ۞ 1 حاضر 2 ملازم 3 متصدی 4 خدمتکار 5 ناشی از

**attender** /ə'tendə(r)/ *noun,* also attendee /ˌæten'diː/

(لە بریتانیا) بەشدار(بکەر) ۞ شرکت‌کنندە

**attention** /ə'tenʃn/ *noun*

1 سەرنج(دان)، (لێ)وردبوونەوە، لێ‌خوردبوونەوە، زەین‌پێدان: *the report's attention to detail* 2 (شەش‌دانگی هۆش: the whole attention) لالێدانەوە، بەتەنگەوەبوون، ئاگاداری تایبەتی، چاودێری، ئاگالێ‌بوون، پێ‌ڕاگەیشتن، بەدیارەوەبوون، چاولێ‌بوون، ئاگاداری، پێ‌ڕاگەیشتن 3 دەستوورێکی میلیتاری کە لەودا سەرباز دەبێ راست بوێستێ و پێی جووت کا و

دەست بەرداتەوە، سەرنج ◌ 1 توجه، دقت 2 عنایت، مراقبت، رسیدگی 3 خبردار (نظامی)

**attentive** /ə'tentɪv/ *adjective*

بەسەرنج، ورد، گوێگر، سەرنجپێداو، وردەوەبوو، بەزەین 4 ئاگادار، وریا، هۆشیار، پڕ(هۆ)شیار، چاودێر ◌ 1 دقیق، متوجه 2 مراقب، ملتفت

**attentively** /ə'tentɪvli/ *adverb*

بە وردی، ورد، بە سەرنجەوە، بە زەینەوە ◌ با دقت، با توجه

**attentiveness** /ə'tentɪvnəs/ *noun*

1 ئاگاداری، چاودێری 2 سەرنجپێدان، وردبوونەوە ◌ 1 مراقبت 2 دقت

**attenuated** /ə'tenjueɪtɪd/ *adjective*

1 لاوازکراو، هێزلێبڕاو، پێچوێنراو: *an attenuated form of the virus* 2 باریک و درێژ ◌ 1 تضعیف‌شده 2 باریک و دراز

**attenuation** /əˌtenju'eɪʃn/ *noun*

1 تەنکبوون، تەنکاندن، لاوازکردن، پێچواندن 2 باریککردنەوە، ناسککردنەوە، کەمکردنەوە، هێنانەخوارەوە، داشکاندن ◌ 1 رقیق‌شدگی، ترقیق 2 تخفیف

**attenuator** /ə'tenjueɪtə(r)/ *noun*

1 هێزلێبڕ، لاوازکەر، پێچوێنەر 2 دەزگایێ بۆ کەمکردنەوەی هێزی سینگناڵێکی رادیۆیی یان دەنگی ◌ 1 تضعیف‌کننده 2 اتنواتور

**attestable** *adjective*

شیاوی سەلماندن، شیاوی پەسندکردن یا مۆرکردن ◌ قابل تصدیق یا تأیید

**attestation** /ˌæte'steɪʃn/ *noun*

1 سەلماندن، بەراستدانان، راستکردنەوە، پشتڕاستکردن، پەسندکردن، مۆرکردن 2 شایەتی، سەتووف(دان)، شایەتیدان 3 سوێندخواردن ◌ 1 تصدیق، تأیید 2 گواهی، استشهاد 3 تحلیف

**Attic** /'ætɪk/ *noun, adjective*

*n* سەربە ئەتیکا لە رۆژهەڵاتی یۆنان، یان ئاتینی کۆن، یان زاراوەی یۆنانی کە لەوێ قسەی پێدەکەن *adj* زاراوەی ئاتیکی کە ئاتینیانی کۆن قسەیان پێدەکرد ◌ آتیک

**attic** /'ætɪk/ *noun*

ئەتیک، ژووری ژێر خەبەنگ یان میچی ماڵ(ەوە) ◌ اتاق زیر شیروانی

**Attila** *noun*, biographical name

ئاتیلا 453–406?: پادشای هونەکان کە پەلاماری ئەورووپای دا، لە لایەن رۆمی و قیزیگۆتەکانەوە لە 451 تێکشکا ◌ آتیلا

**attire** /ə'taɪə(r)/ *noun*

جلوبەرگ، بەرگ، شمەک، کنج، ◌ clothes جامه، لباس

**attired** /ə'taɪəd, US ə'taɪərd/ *adjective*

(فەرمی و وێژەیی *literary*) لەبەرکردوو، داپۆشراو: *She was fashionably attired in a black evening gown* ◌ ملبس

**attitude** /'ætɪtjuːd, US 'ætɪtuːd/ *noun*

1 روانین، دیتن، بۆچوون، تێرین: *changes in public attitudes to marriage* 2 دۆخ، بار، رەوش، مەرەد، بارودۆخ 3 هەڵسوکەوت، رەفتار، رەوتار 4 هەڵوێست، شێوەی جووڵانەوە 5 رێڕەوی فڕۆکە یان کەشتی ئاسمانی ◌ 1 نگرش، نظر 2 وضع، حالت 3 برخورد، رفتار 4 طرز برخورد 5 اتیتیود

**attorney** /ə'tɜːni, US ə'tɜːrni/ *noun, pl.* attorneys

1 پارێزەر، ئاوکات، برێکار، وەکیل 2 (ئەمریکا) پارێزەری لێوەشاو ◌ 1 وکیل دعاوی، وکیل 2 وکیل واجد شرایط

**attorney at law** *noun*

پارێزەر، ئاوکات، برێکار، ئەولەکار ◌ وکیل

**Attorney General** *noun*

(ماف) سەردۆزگەر، جێگری گشتی، دادپرسی گشتی ◌ دادستان کل

**the Attorney General** *noun*

شالیار یان وەزیری دادپرسی (سەرۆکی وەزارەتی دادی ئەمریکی و ئەندامی کابینەی سەرۆکایەتی) ◌ وزیر دادگستری

**attorneyship** /ə'tɜːnɪʃɪp/ *noun*

برێکاری، وەکیلایەتی ◌ وکالت

**attractability** /əˌtræktə'bɪləti/ *noun*

لەڕاکێشانهاتوویی ◌ قابلیت جذب، مجذوبیت

**attractable** /ə'træktəbl/ *adjective*

لەڕاکێشانهاتوو، رادەکێشرێ، لە راکێشان دێ ◌ قابل جذب، مجذوب‌شدنی

**attractant** /ə'træktənt/ *noun, adjective*

راکێشەر (ماک یان مادەیێ (وەک pheromone) کە شتێک رادەکێشێ): *This type of trap uses no bait or other attractant* ◌ اتراکتانت

**attracted** *adjective*

سەوداسەر، هۆگر، دڵبەستە، راکێشراو ◌ شیفته، علاقه‌مند، مجذوب

**attraction** /ə'trækʃn/ *noun*

1 (فیزیک) راکێشان، کێش، کێشان، راکێشکردن: *gravitational/magnetic attraction* 2 سەرنجڕاکێشی، باڵکێشی، دڵبەستەیی، دڵتێچوون، سەوداسەری، دڵڕفێنی: *Sexual attraction is a large part of falling in love* ◌ 1 جذبه، کشش، جذب 2 ربایش، شیفتگی

**attractive** /ə'træktɪv/ *adjective*

سەرنجڕاکێش، دڵکێش، خۆش، دڵگر، دڵبەر، دڵچەسپ، رووبازاڕی، باڵکێش، جوان، دڵڕفێن ◌ جذاب، جالب، جالب توجه

**attractively** /ə'træktɪvli/ *adverb*

سەرنجڕاکێشانە: *attractively priced hotel rooms* ◇ به طور جذابی

**attractiveness** /ə'træktɪvlɪnəs/ *noun*
سەرنجڕاکێشی، جوانی، خوێن‌شیرینی، دڵرفێنی ◇ جذابیت، کشش

**attributable** /ə'trɪbjətəbl/ *adjective*
لە ئەنجامی، پێوەندی هەیە، بووەهۆی، شیاوی دانەپاڵ: *Their illnesses are attributable to a poor diet* ◇ ناشی از، نسبت‌دادنی

**attribute** /'ætrɪbju:t/ *noun*
1 تایبەتمەندی، ڕەوشت 2 نیشانە، بەرزەنگ، دروشم، نموونە، هێما، جیانیشانە، درف، تایبەت‌نیشان(ـە): *a scepter is the attribute of power* ◇ 1 ویژگی، خصوصیت، خصیصه 2 علامت، نماد، علامت شاخص

**attribution** /ˌætrɪ'bju:ʃn/ *noun*
دانەپاڵ، خستنەپاڵ، تایبەتمەندی، ڕەوشت، جیانیشانە (attributional *adj*) ◇ انتساب، اسناد، ویژگی، خصلت

**attributive** /ə'trɪbjətɪv/ *adjective, noun*
*adj* سەربە دانەپاڵ، پاڵدەرانە، سەربە ئاوەڵناو، ئاوەڵناوی‌یانە (وەک *old* لە *the old dog*؛ پروانە predicative) *n* (ڕێزمان) ئاوەڵناو، ڕەنگدێر ◇ *adj* اسنادی، وصفی *n* صفت

**attributive adjective** *noun*
ئاوەڵناوی ڕاستەقینە، ئاوڵناو یا ڕەنگدێری ڕاستەوخۆ ◇ صفت مستقیم

**attributively** /ə'trɪbjətɪvli/ *adverb*
بەشێوەیەکی پاڵدەرانە ◇ به طور اسنادی

**attrited** *adjective*
داخوراو، لاوازکراو، شەکەت‌کراو ◇ فرسایش‌یافته

**attrition** /ə'trɪʃn/ *noun*
1 سووانەوە، خورانەوە، سووان، داخوران، خشان، لیک‌خشان 2 لاوازاندن، شەکەت‌کردن، کەشتەنگی، شەکەتاندن، بەچۆک‌داهێنان (دوژمن): *a war of attrition* 3 پەشیمانی لە گوناه لە ترسی سزادران ◇ 1 فرسایش، اصطکاک 2 تضعیف 3 ندامت ناشی از مجازات گناه

**attuned** /ə'tju:nd, US ə'tu:nd/ *adjective*
ناسیاو، ئاشنا، سەوازەوەبوو، داهاتوو، ڕاهاتوو، خووگرتوو، فێر(بوو): *She wasn't yet -tuned to her baby's needs* ◇ آشنا، عادت‌کرده

**Atty-Gen** *abbreviation* Attorney General (esp. in America)

**ATV** /ˌeɪ ti: 'vi:/ *abbreviation* all-terrain vehicle
ئێی‌تی‌ڤی (ماشێنێکی چکۆلانە، وا داڕێژراوە بۆ هەموو شوێنێ بەکاربێ) ◇ ای‌تی‌وی

**atypical** /ˌeɪ'tɪpɪkl/ *adjective*
ئاوارتە، سەیر، نائاسایی، نائاسا، ناپێوانەیی، ڕێزپەڕ، ناعەدەتی، irregular، unusual: ◇ (atypicality *n*) *atypical behaviour* غیرعادی، نابهنجار

**atypically** /ˌeɪ'tɪpɪkli/ *adverb*
نائاسایی‌یانە، ئاوارتانە، بەشێوەیەکی نائاسایی ◇ به طور غیرعادی

**AU** *abbreviation* 1 ångström unit(s) 2 (also a.u.) astronomical unit(s)

**Au** /ˌeɪ 'ju:/ symb. the chemical element gold (from L. aurum)

**aubade** /əʊ'bɑ:d/ *noun*
هۆنراوە یان پارچە موسیقایێکی گونجاو بۆ بەرەبەیان ◇ اوباد

**auberge** /əʊ'beːʒ, French obɛʀʒ/ *noun*
میوانخانەی لە وڵاتانی فەرەنسی‌زمان ◇ مهمانخانه در کشورهای فرانسوی‌زبان

**aubergine** /'əʊbəʒi:n, US 'oʊbərʒi:n/ *noun*
1 باینجانەڕەشە، کەدووەڕەشە 2 ڕووەک یان پنجی باینجانەڕەشە یا کەدووەڕەشە [*Solanum melongena*] ◇ 1 بادنجان 2 گیاه بادنجان

**aubretia** /ɔ:'bri:ʃə/ *adjective*, also aubrietia
(ڕووەک‌ناسی) گیایێکی گرگنەی هەمیشەسەوز، بە گوڵی سپی، پەمەیی و ئەرخەوانی‌یەوە [*Aubrieta deltoidea*] (بنەڕەت: لە ناوی ڕووەک‌ناسی فەرەنسی Claude *Aubriet*) ◇ نوعی گیاه

**auburn** /'ɔ:bən, US 'ɔ:bərn/ *adjective*
(قژ) ڕەنگی قاوەیی ئامال سوور، خورمایی ◇ خرمایی

**au courant** *adjective*
(فەرەنسی) ئاگادار، up-to-date ◇ در جریان

**auction** /'ɔ:kʃn, 'ɒk-, US 'ɔ:k-/ *noun*
مەزات، هەڕاج (بنەڕەت: لە *auctio(n-)* لاتین "increase") ◇ مزایده

**auctioneer** /ˌɔ:kʃə'nɪə(r), ˌɒk-, US ˌɔ:kʃə'nɪr/ *noun*
دەلالی مەزات یان هەڕاج، هەڕاجگەر ◇ متصدی حراج

**auction house** *noun*
(کۆمپانیا) هەڕاج‌دانەر ◇ حراج‌گزار

**audacious** /ɔ:'deɪʃəs/ *adjective*
1 چاونەترس، ئازا، بوێر، سڵنەکەر، بێباک: *an audacious mountain climber* 2 ڕووودار، بێشەرم، ڕووشە، بێحەیا، ڕووهەڵماڵراو 3 ئازایانە، چاونەترسانە ◇ 1 متهور، بی‌پروا 2 گستاخ، وقیح 3 متهورانه

**audaciously** /ɔ:'deɪʃəsli/ *adverb*
ئازایانە، چاونەترسانە ◇ متهورانه

**audaciousness** /ɔ:'deɪʃəsnəs/ *noun*
نەترسی، ئازایەتی، بێباکی، چاونەترسی ◇ جسارت، تهور

**audacity** /ɔ:'dæsəti/ *noun, pl.* audacities

1 نەترسی، نازایەتی، بێباکی، چاونەترسی، مەترسیکاری: *had the audacity to defy his boss* 2 رووشەیی، رووداری، رووهەڵماڵراوی، بێشەرمی ۞ 1 تهور، شجاعت، جسارت 2 گستاخی

**audial** /ˈɔːdɪəl/ *adjective*

سەربە هەستی بیستن یان ژنەفتن، سەربە هەستی ژنەوایی ۞ وابسته به حس شنوایی

**audibility** /ˌɔːdəˈbɪləti/ *noun*

لەبیستنهاتوویی، لەژنەفتنهاتوویی، لەژنەواییهاتوویی ۞ شنودپذیری

**audibile** /ˈɔːdəbl/ *adjective*

لەبیستنهاتوو، لەژنەفتنهاتوو، بیستەنی، دەبیسرێ ۞ شنودپذیر

**audibly** /-əbli/ *adverb*

(بەشێوەیێ کە) لە بیستن یان ژنەفتن دێ، دەبسترێ، لەبیستنهاتووانە: *'Yes?' she said, yawning audibly* ۞ به طور قابل شنیدن

**audience** /ˈɔːdiəns/ *noun*

1 ئامادەبووان، هاتووان، کۆوەبووان 2 ئاپۆرە، جەماوەر، کۆبوونەوە، جڤین 3 گوێدەران، بیسەران، گوێگران، بینەران: *TV/cinema/movie audiences* 4 خوێنەران 5 بیستن، گوێدان، گوێگرتن 6 چاوپێکەوتن، دیدەنی، یەکتربینین: *an audience with the Pope* ۞ 1 حضار 2 اجتماع، جمعیت 3 شنوندگان، بینندگان، تماشاگران 4 خوانندگان 5 استماع، شنوایی 6 ملاقات

**audio** /ˈɔːdiəʊ, US ˈɔːdioʊ/ *adjective, noun*

*adj* دەنگی: *audio and video cassettes* :*n* *digital audio* ۞ صوتی

**audio-** /ˈɔːdiəʊ, US ˈɔːdioʊ/ *prefix*

پێشگر: بیستن، ژنەوایی، دەنگ، بیستنی و...، ژنەوایی و...: *audiometer، audiophile، audio-visual* (بنەڕەت: لە لاتین *audire* "hear") ۞ پیشوند: شنوایی، صدا، شنوایی و...

**audiobook** *noun*

کتێبی دەنگی ۞ اودیوبوک

**audio frequency** *noun*

لەرە یا فریکوێنسی بیست(ـە)نی یا بیستراو (نێوان 20 تا 20,000 هێرتز) ۞ بسامد شنیداری

**audiological** *adjective*, also audiologic

سەربە ئۆدیۆلۆژی ۞ وابسته به اودیولوژی

**audiologist** *noun*

ئۆدیۆلۆژیست، ژنەواییناس ۞ اودیولوژیست

**audiology** /ˌɔːdɪˈɒlədʒi/ *noun*

لقێ لە زانستی پزشکی کە باسی هەستی بیستن دەکا، ژنەفتناسی، ژنەواییناسی ۞ اودیولوژی

**audiometre** *noun*

بیستنپێو، ژنەفتنپێو، ژنەواییپێو ۞ شنوایی‌سنج

**audiometric** *adjective*

سەربە بیستنپێوی، سەربە ژنەفتنپێوی، ژنەواییپێوییانە ۞ وابسته به شنوایی‌سنجی

**audiometry** /ˌɔːdiˈɒmətri, US -ˈɑːm-/ *noun*

بیستنپێوی، ژنەفتنپێوی، ژنەواییپێوی ۞ شنوایی‌سنجی

**audiophile** *noun*

کەسێ ب.ت. کە دڵبەستە یان هۆگری دەرکردنی دەنگی هایفایە high-fidelity ۞ اودیوفیل

**audio tape** *noun*, also audio cassette

کاسێت یان دەنگبەندی دەنگی ۞ نوار صوتی

**audio-typist** *noun*

ئۆدیۆتایپیست، ژنەفتەنووس؟ (= کەسێ کە گوێ بە کاسێتێ دەدا و ئەوەی کە بیستوویەتی، دەینووسێتەوە) ۞ اودیوتایپیست

**audio-type** *noun*

ئۆدیۆتایپ (= نەوارێکی مەگناتیکییە کە دەنگ دەتوانێ لەسەری تۆمار بکرێ) ۞ نوار شنیداری

**audio-visual** *adjective*

دەنگوێنەیی، دەنگوڕەنگی، بیستاری-دیداری، بیستاری-بیناری؟ ۞ شنیداری-دیداری

**audit** /ˈɔːdɪt/ *noun*

تێڕوانین، پێڕاگەیشتن، پشکنینی حیسابەکان ۞ حسابرسی، ممیزی

**the Audit Commission** *noun*

(بریتانیا) لیژنەی پشکنینی حیسابەکان ۞ کمیسیون ممیزی

**audition** /ɔːˈdɪʃn/ *noun*

1 بیستن، ژنەفتن 2 (کۆن) هێز یا توانایی بیستن 3 گوێدان 4 تاقیکاری پێرفۆرمانس ۞ 1 شنوایی 2 قوەی سامعه 3 استماع 4 آزمون اجرا

**auditive** *adjective*

پێوەندی بە بیستنەوە هەیە ۞ سمعی

**auditor** /ˈɔːdɪtə(r)/ *noun*

1 پشکنەر (حیسابەکان): *The auditors' report will be submitted to the directors at the end of the year* 2 گوێدێر، بیسەر، گۆهدار (auditorial *adj*) ۞ 1 حسابرس 2 شنونده

**auditorium** /ˌɔːdɪˈtɔːriəm/ *noun, pl.* auditoriums or auditoria

1 ئۆدیۆتۆریۆم، بیستار، تالار، خانووبەرەی کۆبوونەوە گشتییەکان 2 بەشێ لە تیاتر یان سالۆن کە گوێگران یان بینەران دادەنیشن ۞ 1 تالار، ساختمان اجتماعات عمومی 2 اودیوتوریوم

**auditory** /ˈɔːdətri, US -tɔːri/ *adjective, noun* (*pl.* auditories)

*adj* پێوەندی بە بیستنەوە هەیە، سەربە ژنەوایی یان ژنەفت، ژنەفتی، سەربە هەستی بیستن *n* بینەران، بیسەران، گوێگران ۞ *adj* سمعی، شنوایی *n* بینندگان، شنوندگان

**auditory nerve** *noun*

دەماری بیستن یان ژنەوایی ۞ عصب شنوایی

**au fait** /əʊ 'feɪ, French o fɛ(t)/ *adjective*
(فەرەنسی) ئاگادار، بەئاگا، بەلەد، ناسیاو، ئاشنا: *I'm new here so I'm not completely au fait with the system* ◌ مطلع، آشنا

**au fond** /əʊ 'fɒ̃, French o fɔ̃/ *adverb*
(فەرەنسی) لە بنەڕەتدا، لەتەرکەنەدا، in fundamentally ،at bottom ،essence ◌ اساساً

**Aug** = August

**auger** /'ɔːgə(r)/ *noun*
سمۆ، مەتە، بورغوو، برغوو (بۆ کونکردن لە دار، گڵ یان سەهۆڵ) ◌ متە

**auger bit** *noun*
سەرسمۆ، سەرمەتە، نووکە یان سەربرغوو ◌ سرمتە

**auger shell** *noun*
قاپیلکسمۆیی: جۆرێ لەشنەرمی دەریایی، بە قاپیلکی پێچپێچۆکەیی باریکەوە [*Terebra* و جۆرەکانی تر] ◌ نوعی نرم‌تن

**aught** /ɔːt/ also ought = anything

**augite** /'ɔːdʒʌɪt/ *noun*
جۆرێ کانی ئالومینۆسیلیکاتی aluminosilicate رەش یان سەوزی توند، لە زۆر بەردی ئاگریندا igneous دەبینرێ (augitic *adj*) ◌ اوجیت

**augment** /'ɔːgˌment/ *noun*
زیادە: بزوێنێکی vowel پێشدانراو یان درێژکردنەوەی بزوێنی سەرەتایی initial vowel بۆ نیشاندانی سەردەمی رابردوو لە کاری verb زمانانی سانسکریت، یۆنانی، ئەرمەنی Armenian و فریژیایی Phrygian ◌ فزونە

**augmentation** /ˌɔːgmen'teɪʃn/ *noun*
1 زۆربوون، زیادبوون، زیادکردن، گەورەکردنەوە، فرەبوون، زۆری، فرەیی 2 زیادی، زیادە، سەرخراو، addition ◌ 1 افزایش، فزونی 2 اضافە، افزودە

**augmentative** /ˌɔːg'mentətɪv/ *adjective*
1 شیاوی زۆربوون، زۆر دەبێ 2 زیادبوو، کەڵەکەبوو 3 (زمانەوانی) بەهێزکەری واتای وشەیێ (augmentatively *adv*) ◌ 1 قابل افزایش 2 متراکم‌شوندە 3 اوگومنتاتیو

**augmented** *adjective*
(موسیقا) فرە ◌ افزودە

**augur** /'ɔːgə/ *noun*
(لە رۆمی کۆندا) فاڵگرەوە، گیرزان، پێشزان ◌ طالع‌بین، غیبگو

**augury** /'ɔːgjʊri/ *noun, pl.* auguries
1 (وێژەیی) ودم، شووم، هاتونەهات، فەر، omen 2 پێش‌زانی، غەیب‌زانی، فاڵگرتنەوە ◌ 1 شگون 2 غیبگویی، تفأل، طالع‌بینی

**August** /'ɔːgəst/ *noun*
تاب، تەباخ، خەرمانان، گەلاوێژ، ئۆگۆست، ئۆگێست (هەشتەمین مانگ لەنێوان July و September دا؛ بنەڕەت: لە ناوی ئۆگۆستۆس سیزار *Augustus* Caesar یەکەمین ئیمپراتۆری رۆم وەرگیراوە) ◌ اوت

**august** /ɔː'gʌst/ *adjective*
بەشکۆ، مەزن، پایەبەرز، گەورە، بەئەندێش، بەسام، بەشەوکەت، majestic: *her august lineage* ◌ شکوهمند، پرعظمت، عظیم‌الشأن

**Augustan** /ɔː'gʌstən/ *adjective*
1 ئۆگۆستان (= سەربە دەسەڵاتداری ئۆگاستان قەیسەر، وەختێ کە وێژەی لاتین گەشاوە) 2 کلاسیکاڵ (هەر وێژەیێ بێ) ◌ آوگوستان

**Augustinian** /ˌɔːgə'stɪnɪən/ *adjective, noun*
*adj* سەربە سەینت ئەگۆستین Agustine (-354 430) یان رێبازەکەی، ئەگۆستینی *n* 1 ئەندامی تیرەی ئەگۆستینی 2 لایەنگری رێبازی ئەگۆستین، ئەگۆستینی ◌ آوگوستان

**augustness** /ɔː'gʌstnəs/ *noun*
شکۆ، سام، شەوکەت، ئەندێش، مەزنی، گەورەیی ◌ شکوە، عظمت

**auk** /ɔːk/ *noun*
ئۆک، دەنووکتیغە (باڵندەیەکی دەریایی باڵ و ملکورت [خێزان Alcidae] (بنەڕەت: لە *álka* نۆرویژی کۆن "razorbill") ◌ اوک

**auld** /ɔːld, US ɑːld/ = Scottish form of old

**auld lang syne** /ˌɔːld læŋ 'saɪn/ *noun*
(لە سکاتلەند) رۆژگاری خۆشی رابردوو (ب.ت. دەستپێکردنی سەری ساڵی نوێ و دەربڕینی هەست و سۆزی دۆستایەتی) ◌ روزگار خوش گذشتە

**aumbry** /'ɔːmbri/ *noun,* also ambry, *pl.* aumbries
دۆلابی، دۆلابێکی چکۆلانە لە دیواری کلیسەدا ◌ اومبری

**au naturel** /ˌəʊ natjʊ'rɛl, French o natyʀɛl/ *adjective, adverb*
بە شێوەی سروشتی، بە سادەترین شێوە ◌ بە حالت طبیعی

**aunt** /ɑːnt, US ænt/ *noun*
1 پوور، میمی، میمک؛ پوور، پلکە، تیتک (خوشکی باوک) 2 خاڵۆژن 3 مامۆژن، ژناپ، تاژەن ◌ 1 خالە؛ عمە 2 زن‌دایی 3 زن‌عمو

**auntie** /'ɑːnti, US 'ænti/ also aunty, *pl.* aunties = aunt, (Auntie) Brit. the BBC

**Aunt Sally** /ˌɑːnt 'sæli, US ˌænt/ *noun, pl.* Aunt Sallies
(کەس یان شتێ) ئامانجی رەخنە، ئامانجی هێرش ◌ آماج انتقاد

**au pair** /ˌəʊ 'peə(r), US ˌoʊ 'per/ *noun*
ئۆپێر: کچێکی بیانی کە لە خێزانێکدا دەمێنێتەوە بۆ فێربوونی زمان و لە کاروباری نێومالدا و ئاگالێبوونی منالاندا یاریدەیان دەدا ◌ اُپر

**aur(i)-** *prefix*
پێشگر: گوێ (بنەڕەت: لە *auris* لاتینەوە "ear")
۞ پیشوند: گوش

**aura** /'ɔ:rə/ *noun, pl.* aurae /-ri:/ or auras
1 خەرمانە، تاماڕ 2 کەش‌وهەوا، ئەتمۆسفێر 3 بەرامە، بۆن 4 (پزشکی، فنێ) مووچڕکە، تەزوو، قورسایی، تەز (بنەڕەت: بە ڕێگای لاتین لە یۆنانییەوە "breath ،breeze") ۞ 1 هالــه 2 حال‌وهوا 3 رایحه 4 پیش‌حمله

**aural** /'ɔ:rəl/ *adjective*
1 گوێیی، سەربە گوێ، پێوەندی بە گوێیەوە هەیە: *aural and visual images* 2 سەربە هەستی بیستن یان ژنەفتن ۞ 1 وابسته به گوش 2 وابسته به حواس شنوایی

**aurally** /'ɔ:rəli/ *adverb*
لە ڕێگای گوێوە، بە ڕێگای گوێوە ۞ از طریق گوش

**aurar** = plural form of eyrir

**aureate** /'ɔ:rɪət/ *adjective*
زێڕین، زێڕکرد، زێڕی، لەزێڕ: *aureate light* ۞ طلایی

**aureole** /'ɔ:riəʊl, US -oʊl/ *noun*, also aureola /ɔ:'rɪələ/
1 خەرمانە، تاجی دەوری خۆر و مانگ، ئاخلە (هی مانگ)، بازنەڕووناکی 2 خەرمانە یان ڕووناکی دەوری سەری زاتە پیرۆزەکان 3 بازنان، ناوچەیێکی بازنەیی یان ئالقەئاسای تەختەبەردە گرکانییەکان کە تۆواوەیان تێچووە (بڕوانە intrusive) ۞ 1 هاله، تاج خورشید 2 هاله یا نور سر مقدسین 3 اوریول

**aureus** /'ɔ:rɪəs/ *noun, pl.* aurei
کۆینێکی ڕۆمی کۆن، بایی 25 denarius زێو ۞ اوریس

**au revoir** /ˌəʊ rə'vwɑ:(r), US ˌoʊ/ *interjection*
(فەڕەنسی) خودات لەگەڵ، بە خودام سپاردی، ئۆ ڕۆڤوار ۞ خدا نگهدار

**auric**[1] /'ɔ:rɪk/ *adjective*
زێڕیی، زێڕەکی، زێڕین، زێڕاوی، زێڕدار، زێڕتیابوو، زێڕی تیایە، داڕێژراو لە زێڕ ۞ وابسته به طلا، حاوی طلا

**auric**[2] /'ɔ:rɪk/ *adjective*
(کیمیا) سەربە زێڕ بە هاوهێزی سێوە ۞ اوریک

**auricle** /'ɔ:rɪkl/ *noun*
1 (توێکاری و گیانەوەرناسی) نەرمەگوێ، چیچک(ە) 2 گوێچکەلە (بنەڕەت: لە *auricular* لاتین، چکۆلێنراوی *auris* "گوێ") ۞ 1 لالەی گوش 2 دهلیز قلب

**auricula** /ɔ:'rɪkjʊlə/ *noun*
گوێورچە، گەلاگوێورچە، گیاگوێچکەلە، primila یێکی کێوی، بە گەلایێ کە شێوەی گوێی ورچ دەدا [*Primula auricula*] ۞ اوریکولا

**auricular** /ɔ:'rɪkjʊlə/ *adjective*
1 گوێیی، سەربە گوێ 2 گوێچکەلەیی، سەر بە گوێچکەلەی دڵ: *auricular tachycardia* 3 گوێئاسا 4 چرپە، سرت‌وهۆڕ، نهێنی ۞ 1 وابسته به گوش 2 وابسته به دهلیز قلب 3 گوش‌مانند 4 در گوشی

**auriculated** *adjective*, also auriculate
شێوەگوێ، لەگوێچوو، گوێیی، گوێیانە، گوێئاسا ۞ گوش‌مانند

**auriferous** /ɔ:'rɪf(ə)rəs/ *adjective*
زێڕدار، زێڕاوی، پڕزێڕ، زێڕلەگەڵ ۞ طلادار

**Auriga** *noun*, Latin, *charioteer*
(لاتین) ئەڕابەوانە: کۆئەستێرەی نێوان Perseus و Gemini ۞ آوریگا

**Aurignacian** /ˌɔ:rɪ'njeɪʃ(ə)n, US ˌɔ:rɪg'neɪ-/ *adjective*
(شوێنەوارناسی) ئۆریگناسیایی: سەربە سەردەمی سەرەتای چاندی بەردینی کۆنی پێشتر لە ئەورووپا و ڕۆژهەڵاتی نزیک، دەوربەری 34,000-29,000 ساڵ لەوە پێش (بنەڕەت: لە *Aurignacien* فەڕەنسی، لە *Aurignac* لە باشووری ڕۆژاوای فەڕەنسە، شوێنێ کە کەلوپەلی سەربەم فەرهەنگە و چاندە دۆزرایەوە) ۞ آوریگناسین

**aurilave** /'ɔ:rɪleɪv/ *noun*
گوێسڕ(ە) ۞ گوش‌پاک‌کن

**auriscope** /'ɔ:rɪskəʊp/ *noun*
گوێبین، گوێدۆز ۞ گوش‌نما

**aurist** /'ɔ:rɪst/ *noun*
دوکتۆری گوێ، گوێپزشک ۞ پزشک گوش

**aurochs** /'ɔ:rɒks, US 'aʊ-/ *noun, pl.* same
(ئەڵمانی) جۆرێ گاکێوی شاخ‌درێژی کەتەی قڕتێکەوتوو، کە ماڵاتی خۆماڵی لە بەرەی ئەوون [*Bos primigenius*] ۞ آوروکس

**aurora** /ɔ:'rɔ:rə/ *noun, pl.* auroras or aurorae /-ri:/
1 ئۆرۆرا (خوای بەرەبەیان لای ڕۆمییەکان) 2 بەرەبەیان، تاریک‌وڕوون، بەرەبەیانی جەمسەری (باکوور) ۞ 1 آرورا 2 پگاه، شفق (قطبی)

**aurora australis** /ɔ:ˌrɔ:rə ɒs'trɑ:lɪs, ɔ:s't-, US ɔ:s't-/ *noun*
بەرەبەیانی باشووری (لە نیوەگۆی باشووری) ۞ شفق جنوبی

**aurora borealis** /ɔ:ˌrɔ:rə ˌbɔ:rɪ'eɪlɪs/ *noun*
بەرەبەیانی (جەمسەری) باکووری، گزنگی باکووری ۞ شفق شمالی

**auroral** /ɔ:'rɔ:rəl/ *adjective*
بەرەبەیانی، سەربە یان پێوەندی بە aurora وە هەیە ۞ فجری

**auscultation** /ˌɔ:skəl'teɪʃn/ *noun*

گـوێ‌دێـری، گـوێ‌دان (تـێ‌ڕوانـینی نـەخۆش بـەڕێگای گوێدان بـە دەنگـی دڵ، سـیەکان و ئەندامانی تر) ◌ سمع

**auscultator** /'ɔːskəlteɪtə(r)/ *noun*

گوێ‌دێر ◌ آوسکیولاتور

**auscultatory** /ɔː'skʌltət(ə)ri/ *adjective*

سـەربە گوێ‌دێری، گوێ‌دێری‌یانە ◌ سمعی

**Auschwitz** *noun*, also Oświęcim, geographical name

(ئەڵمانی) ئاشفیتز، ئاشویتز: شارێکی باشووری ڕۆژاوای پۆڵەند، شوێنی کامپی مەرگ یان کـاری زۆرەملێ concentration camp نازی‌یەکـان بە درێژایی شـەڕی جیهـانی دووهـەم، حـەشیمەت 45,282 ◌ آشویتز

**Auslese** /'aʊsleɪzə/ *noun*

مـەیێکـی سـپی لـە بنـەڕەتا ئەڵـمانی، لـە ترێـی پاشەڕۆک دەگیرێ ◌ اوسلیز

**auspices** /'ɔːspɪsɪz/ *noun*, under the auspices of

لەگـەڵ پاراسـتنی، لـە سـایەی سـەری، لـەژێر سێبەری، لە سایەی پشتیوانی، بە یارمەتی، بە پـشتیوانی، بە پـشتگیری، بە سەرپەرسـتی: *a peacekeeping force under United Nations auspices* ◌ تحت حمایت، تحت توجهات

**auspicious** /ɔː'spɪʃəs/ *adjective*

پـیرۆز، مـەبارەک، موبـارەک، بـەودم، بـەهات، هات، شوومی باشە، هەزەخ، بەختەوەر، بەختیار، propitious, prosperous: *made an auspicious beginning* ◊ *an auspicious year Their first meeting was hardly auspicious* ( auspiciously /ɔː'spɪʃəsli/ *adv*: بـە پـیرۆزی‌یـەوە؛ auspiciousness /ɔː'spɪʃəsnəs/ *n*: پیرۆزی) ◌ خجسته، مبارک، نیک‌بخت

**Aussie** /'ɒzi, US 'ɔːzi, 'ɑːzi/ *adjective, noun*, also Ozzie

(نافەرمی) ئەوسترالیایی ◌ استرالیایی

**austere** /ɒ'stɪə(r), ɔː'st-, US ɔː'stɪr/ *adjective*

1 وشـک‌ورەق، بەڕشت، شێلگیر، توند، سەخت، توندگر، سـەختگیر: *My father was a distant, austere man* 2 ڕووگـرژ، ڕووناخۆش، مرومۆچ 3 سەخت، گران، چەتوون، دژوار 4 سـادە، نـەڕازاو، بـێ‌زێـڕوزێو: *Their clothes were always austere* 5 لەخواترس، پارێزگـار (austereness *n*) ◌ 1 خشک، جـدی 2 عبوس، ترشرو 3 شاق 4 ساده 5 پارسا

**austerely** /ɒ'stɪəli, ɔː'st-, US ɔː'stɪrli/ *adverb*

1 سـادە، بێ‌زێڕوزێو 2 بە ڕووگرژی‌یەوە ◌ 1 ساده 2 با ترشرویی

**austerity** /ɒ'sterəti, US and BrE also ɔː'ster-/ *noun, pl.* austerities

1 لەخواترسی، پارێزگـاری 2 سـەختی، دژواری، چەتوونی، سـەختگیری، توندگری، توندگرتن 3 ڕووگـرژی، ڕووتاڵـی 4 سـادەیی، نـەڕازاوی، بێ‌زێڕوزێوی ◌ 1 پارسایی، ریاضت 2 مشقت، سختی، عسرت 3 سختگیری 4 ترشرویی 5 سادگی، بی‌پیرایگی

**Austr(o)-**[1] /'ɒstrəʊ, US 'ɔːs-/ *prefix*

پێـشگر: ئەوسـتریا (نەمـسا)، ئـوتریش، ئەوسـترییایی، ئەوسـتریایی و...: *Austro-Hungarian* ◌ پیـشوند: اتـریش، وابـسته بـه اتریش، اتریشی و...

**Austr(o)-**[2] /'ɒstrəʊ, US 'ɔːs-/ *prefix*

پێـشگر: 1 ئەوسـترالیایی، ئەوسـترالیایی و...: *Austro-* 2 باشـووری: *Austro-Malayan Asiatic* (بنـەڕەت: لـە *australis* لاتینـەوە "باشووری") ◌ پیشوند: 1 استرالیایی، استرالیایی و... 2 جنوبی

**austral** /'ɒstrəl, 'ɔːs-, US 'ɔːs-/ *adjective*

1 باشـووری، سـەربە نیوەگـۆی باشـووری 2 (Austral) سەربە ئەوسترالیا یان ئەوسترالاسیا ◌ 1 جنوبی 2 اوسترال

**Australasian** /ˌɒstrə'leɪʒ(ə)n, US -ʃ(ə)n/ *adjective, noun*

*adj* سـەربە ئۆقیانووسـیە، ئۆقیانووسـیەیـی *n* خەڵـکی ئۆقیانووسیە، ئۆقیانووسـیەیـی ◌ *adj* وابسته به اقیانوسیه *n* اهل اقیانوسیه

**Australian** /ɒ'streɪliən, US and BrE also ɔː'streɪ-/ *noun*

ئەوسترالیا، ئەوسترالیایی، خەڵکی ئەوسـترالیا ◌ استرالیایی، اهل استرالیا

**Australian pine** – norfolk island pine

**Australian Rules** *noun*, also Australian Rules football

ڕوولزی ئەوسـترالیایی (یاری‌یەکی ئەوسـترالیایی لە ڕاگـبی دەچـێ و دوو تیـپی 18 کەسـە یـاری دەکەن) ◌ رولز استرالیایی

**Australoid** *noun, adjective*, also Australioid

*n* ئەندامی کۆمەڵێ لە گەلان کە بە پلەی یـەکەم لە ڕەسـەنە ئەوسـترالی‌یەکـان پێکهـاتووە بـەڵام جاروبار Papuan ـەکان، Melanesian ـەکان و چەندین گەلی کورتەباڵای تر وەک نێگریتۆکـان Negrito ی فیلیپین، کۆمـەڵـەدوورگـەی مالیزیـا و دوورگەکـانی ئەنـدامان Andaman و هینـدێ لە خێڵەکانی ناوەند و باشووری هیند دەگرێتـەوە *adj* سـەربـە یـان پێـوەنـدی هـەیـە یـان شـێوەی ئەوسترالۆیدەکان دەدا ◌ استرالوید، استرالوئید

**australopithecine** /-ɪsiːn/ *noun, adjective*

*n* (جاروبـار Australopithecine) ئـەنـدامێکی توخمی Australopithecus *adj* سـەربـە (یان

پێـوەنـدی هـەیـە) یـان شـێوەی تـوخمی ئـەوسـترالوپیتیکوس یـان ئـەندامـەکـانی دەدا ◌ استرالوپیتـین

**Australopithecus** /ˌɒstrələʊˈpɪθɪkəs, US ˌɔː-/ *noun*

تیرەیێ لە بووبەردی سەرەتاکە دوویێ‌کان بە هەردوو تایبەتمەندی مـەیموونی و مرۆڤی، لە نیـشتووەکانی سـەردەمی نـوترە Pliocene و نوترینەی Pleistocene کۆن‌تردا دۆزراوەتەوە ◌ اوسترالوپیتیکوس

**Austrian** *adjective, noun*

*adj* سـەربە نەمـسا یـا نـوتریش (بـە ئـەڵـمانی Österreich)، ئەوستریایی *n* خەڵکی ئەوستریا، نۆتریشی ◌ *adj* وابسته به اتریش *n* اهل اتریش

**Austrian pine** *noun*

[*Pinus nigra*] کاژی ئەوستریایی یان نۆتریشی ◌ نوعی درخت

**Austro-Asiatic** *adjective, noun*

*adj* سـەربە خێـزانی ئـەو زمانانـەی کـە لـە باشووری رۆژهـەڵاتی ئاسـیا قـسەی پێ‌دەکرێ، وەکوو خێزانی مۆن‌کمێر یان مۆن‌خمێر -Mon Khmer و موندا Munda *n* ئەو خێزانە زمانی‌یە ◌ آوستروآسیاتیک

**Austronesian** /ˌɒstrə(ʊ)ˈniːzɪən, -ʒ(ə)n, ˌɔː-/ *adjective, noun*

*adj* ئـەوسـترۆنیزیایی: سـەربە خێـزانی ئـەو زمانانەی کە لە ناوچـەی بەرینی ماداگاسکار لە رۆژاواوە تـا دوورگـەکانی پاسـیفیک لـە رۆژهـەڵاتدا قـسەی پێ‌دەکرێ *n* ئـەم خێزانـە زمانی‌یە ◌ آوسترونزیایی

**aut-** = auto-

**autacoid** *noun*

هۆرمۆن، هۆرمـۆن: مـاکێکی چـالاک لـەبـاری کارئـەنـدامناسـی‌یـەوە (وەک serotonin، bradykinin یـان angiotensin) کـە لـە لایـەن لەشەوە بەرهەم دێترێ (*adj* autacoidal: سەربە ئۆتاکۆید) ◌ اوتاکوئید، هورمون

**autarchy** /ˈɔːtɑːki, US ˈɔːtɑːrki/ *noun*, also autatchies

ئۆتـارکی، حکومـەتی تاکەکەسـی، تـاک‌دەسـەڵات‌داریتی، دیکتاتۆری، autocracy (autarchic *adj* ؛autarch *n*) ◌ اسـتبداد، حکومت مطلقه

**autarkic** *adjective*

سەربە خۆبژیوی، سـەربە سـەربەخۆیی ئابووری ◌ وابسته به خودکفایی

**autarky** /ˈɔːtɑːki, US ˈɔːtɑːrki/ *noun*, also autarchy, *pl.* autarkies

1 خۆبژیـوی، سـەربەخۆیی ئـابووری، self-sufficiency 2 حکومـەت یـان کۆمەڵـگای خۆبژیو ◌ 1 خودکفایی 2 دولت یا جامعـەی خودکفا

**autecological** *adjective*

سەربە ئۆتیکۆلۆژی ◌ وابسته به اوتکولوژی

**autecology** /ˌɔːtɪˈkɒlədʒi/ *noun*, also autoecology

خۆبـوو(م)ناسـی، ژینگـەناسـی جـۆری: لێکۆڵینەوەی ژینگەناسی‌یانەی جۆرێکی تایبەتی particular species (بڕوانـە synecology) ◌ اوتکولوژی

**authentic** /ɔːˈθentɪk/ *adjective*, also authentical

راست، دروست، رەسەن، عەسڵ، راستەقینە، باوەڕپێکراو، باوەڕمەند، جێی‌باوەڕ، جێی‌متمانە ◌ صحیح، اصیل، معتبر، موثق

**authentically** /-kli/ *adverb*

بەشێوەیەکی دروست، راستانە ◌ به طور صحیح

**authentication** /ɔːˌθentɪˈkeɪʃn/ *noun*

سـەلماندن، راسـتاندن، پـشت‌راسـت‌کردنـەوە، ساخ‌کردنەوە، پەسندکردن ◌ اثبات، تأیید

**authenticated** *adjective*

پەسندکراو، سەلمێنراو، مۆرکراوە ◌ مورد تأیید

**authenticity** /ˌɔːθenˈtɪsəti/ *noun*

رەسـەنایەتی، دروسـتی، راسـت‌بـوون، جێی‌باوەڕبوون، بـاوەڕمـەندی، باوەڕپێکراوی: *The authenticity of the letter is beyond doubt* ◌ اصالت، صحت، اعتبار

**authigenic** /ˌɔːθɪˈdʒenɪk/ *adjective*

(زەوی‌ناسـی، کـان یـان کەرەسـەکانی تـر) پێکهـاتوون لـە شـوێنی ئێـستایان (بڕوانـە allogenic) ◌ اوتیجنیک

**author** /ˈɔːθə(r)/ *noun*

1 نووسـەر، نڤیـسکار، دانـەر: *Who is your favourite author?* 2 دروستکـەر، داهێنـەر، داڕێژەر ◌ 1 نویسنده، مؤلف 2 مصنف، مبدع

**authoress** /ˈɔːθəres/ *noun*

نووسەر، نڤیسکار، دانەر (ژن) ◌ نویسنده، مؤلف

**authorial** /ɔːˈθɔːriəl/ *adjective*

نووسـەریانە، سـەربە نووسـەر یـان دانـەر: *the authorial voice that speaks to the reader* ◌ وابسته به مؤلف

**authoring** /ˈɔːθərɪŋ/ *noun*

دروسـت‌کـردنی بەرنامـە کـامپیوتێری‌یـەکان، بـێ‌بـەکارهێنانی زمـانی بەرنامـەدانان بـۆ بـەکارهێنانی لـە بەرهەمـەکانی فرەمیـدیا (کامپیوتێری)دا ◌ اسورینگ

**authoritarian** /ɔːˌθɒrɪˈteəriən, US əˌθɔːrəˈter-, əˈθɑːr-/ *adjective, noun*

1 *adj* فاشیـستی، دیکتـاتۆری، سـەرەڕۆیی 2 سەرەڕۆ، زۆردار، زۆردارانـە 3 دەسـەڵات‌خـواز، دەسـەڵات‌پەرسـت *n* 1 کـەسـێکی زۆردار 2 لایـەنگری دیکتـاتۆری ◌ 1 *adj* اسـتبدادی،

خودکامە 2 مستبد، خودرأی، مستبدانە 3 اقتدارطلب، قدرت‌طلب *n* 1 آدم خودرأی 2 طرفدار استبداد

**authoritarianism** *noun*
دەسەلات‌خوازی، دەسەلات‌گەری ◌ سلطه گرایی، اقتدارگرایی

**authoritative** /ɔːˈθɒrətətɪv, US əˈθɔːrəteɪtɪv, əˈθɑːr-/ *adjective*
1 بەدەسەلات، دەس‌ڕۆیشتوو، بەهێز، بەسام 2 دەستووردەرانە، زۆردارانە، دیکتاتۆری: *an authoritative tone of voice* 3 فەرمی: *authoritative church doctrines* 4 جێی‌باوەڕ، باوەڕپێکراو، پشت‌پێبەستراو، لێ‌ڕاپێنراو: *an authoritative source*، *the most authoritative book on the subject* (*authoritativeness n*) ◌ 1 مقتدر، بااقتدار، باابهت 2 تحکم‌آمیز، آمرانه 3 رسمی 4 معتبر، موثق

**authoritatively** /ɔːˈθɒrətətɪvli, US əˈθɔːrəteɪtɪvli, əˈθɑːr-/ *adverb*
زۆردارانە، دەستووردەرانە ◌ به طور تحکم‌آمیز

**authority** /ɔːˈθɒrəti, US əˈθɔːr-, əˈθɑːr-/ *noun, pl.* authorities
1 دەسەلات، حوکم، رایە، هێز، توانایی، کەلێز، دەس‌ڕۆیشتوویی: *in a position of authority* ◊ *Only the manager has the authority to sign cheques* ◊ *the moral authority to run the country* 2 سەرپشکی 3 ڕێدان، ڕێ‌پێدان، دەستووردان: *We acted under the authority of the UN* 4 ماف 5 دەستوورنامە 6 خاوەن‌دەسەلات، بەرپرس 7 بەرپرسایەتی، لێپرسراوێتی 8 ژێدەر، سەرچاوەی باوەڕپێکراو 9 کتێبی جێی‌باوەڕ 10 شارەزا، پسپۆڕ: *She's an authority on criminal law* 11 (authorities) کاربەدەستان، رایەداران، بەرپرسان، هێزبەدەستان: *I have to report this to the authorities* ◌ 1 اقتدار، قدرت، نفوذ 2 اختیار 3 اجازه 4 حق 5 مجوز 6 صاحب‌اختیار، مسؤل 7 مسؤلیت 8 مرجع، منبع 9 کتاب معتبر 10 کارشناس 11 (در جمع) مقامات، مسؤلان

**authorization** /ˌɔːθəraɪˈzeɪʃn, US ˌɔːθərəˈzeɪʃn/ *noun*
1 دەسەلات‌پێدان 2 ڕێدان، ڕێ‌پێدان، بەڵگەی ڕێدان 3 دەستوورنامە: *Can I see your -rization?* ◌ 1 اعطای اختیار 2 اجازه 3 مجوز

**authorized** *adjective*
1 ڕێدراو، دەستوورلەسەر، ڕەوا 2 دەسەلات‌پێدراو، خاوەن‌دەسەلات ◌ 1 مجاز 2 دارای اختیار

**the Authorized Version** *noun*
وەرگێرانی ئینگلیسی کتێبی پیرۆز کە یەکەم جار لە 1611دا بڵاو بۆوە و لە لایەن جیمزی (یان جەیمز) یەکەمەوە James I پشتیوانی کرا تا لە کلیسەکاندا بەکاربێنرێ ◌ ترجمەی انگلیسی کتاب مقدس

**authorship** /ˈɔːθəʃɪp, US ˈɔːθərʃɪp/ *noun*
نووسەرایەتی، نووسەری ◌ نویسندگی

**autism** /ˈɔːtɪzəm/ *noun*
ئۆتیزم، خۆخواردنەوە، لەخۆداماندەوە ◌ اوتیسم

**autistic** /ɔːˈtɪstɪk/ *adjective*
خۆخۆرەوە، لەخۆداماو، ئۆتیستیک: *autistic behaviour* ◌ مبتلا به اوتیسم

**auto**[1] /ˈɔːtəʊ, US ˈɔːtoʊ/ *noun*
هەسارە ◌ سیارە

**auto**[2] = automobile

**auto**[3] = automatic

**auto-**[1] /ˈɔːtəʊ, US ˈɔːtoʊ/ (also aut-) *prefix*
پێشگر: 1 خۆ، خود: *autocrat* 2 خۆکاری، خۆبەخۆ، ئۆتوماتیکی، وەک *autoxidation* (بنەڕەت: لە *autos* یۆنانی "self") ◌ پیشوند: 1 خود 2 اتوماتیکی

**auto-**[2] *prefix*
پێشگر: ماشین، ئۆتومبیل ◌ پیشوند: خودرو، اتومبیل

**autoantibody** *noun, pl.* autoantibodies
خۆئانتی‌بادی، خۆدژەتەن ◌ اوتوآنتی‌بادی

**autobahn** /ˈɔːtə(ʊ)bɑːn, German ˈaʊtobaːn/ *noun*, also Autobahn
ڕانەڕێ، ماشێنەڕێ (لە ئاڵمان، سویس و نەمسا) ◌ آزادراه

**autobiographical** /ˌɔːtəˌbaɪəˈgræfɪkl/ *adjective*, also autobiographic
خۆژیننامەیی، خۆژیاننامەیی ◌ (وابسته به) زندگی‌نامەی شخصی

**autobiography** /ˌɔːtəbaɪˈɒgrəfi, US -ˈɑːg-/ *noun, pl.* autobiographies
خۆژیاننامە، خۆژیننامە، سەربردەی خۆ ◌ زندگی‌نامەی شخصی

**autocatalysis** *noun*
خۆهاندەرە، خۆتاودەرە، ئۆتۆکاتالیسیس ◌ اتوکاتالیز

**autochthon** /ɔːˈtɒkθənəs/ *noun, pl.* autochthons or autochthones /-θəniːz/
دانیشتووی ڕەسەن، ڕەسەن، بنەنشین، خۆجێیی ◌ بومی

**autochthonous** /ɔːˈtɒkθənəs/ *adjective*
1 ڕەسەن، بنەنشین، سەرەتانشین، خۆجێیی 2 (زەویناسی) خۆجێیی، پێکهاتوو لە شوێنی خۆیدا ◌ 1 بومی 2 اوتوکتونوس

**autoclave** /ˈɔːtə(ʊ)kleɪv/ *noun*
قابلەمە، دیگ ◌ قابلمە

**autocracy** /ɔːˈtɒkrəsi, US ɔːˈtɑːk-/ *noun, pl.* autocracies
دەسەلات‌دارێتی تاکەکەسی، تاک‌فەرمان‌داری،

دیکتاتۆری ۞ استبداد، خودکامگی، دیکتاتوری
**autocrat** /'ɔːtəkræt/ *noun*
1 تاکفەرماندار، تاکەدەسەڵاتدار، زەواڵ؟ 2 مرۆی زۆردار یان دیکتاتۆر ۞ 1 حاکم مطلق 2 شخص خودکامه
**autocratic** /ˌɔːtə'krætɪk/ *adjective*
تاکفەرمانداریيانە، تاکەدەسەڵاتدارانە، دیکتاتۆر، زۆردارانە: *an autocratic manager* ۞ استبدادی، مطلقه، دیکتاتور، مستبدانه
**autocratically** /-kli/ *adverb*
دیکتاتۆرانە، زۆردارانە ۞ مستبدانه
**auto-creation** *noun*
خۆئافراندن، خۆدروستکردن ۞ خودآفرینش
**autocross** /ɔːtəʊkrɒs, US 'ɔːtoʊkrɔːs/ *noun*
ئۆتوکراس (= وەرزش یا پێشبڕکێی ماشین بە دەوری وڵاتدا) ۞ اتوکراس
**autocue** /'ɔːtəʊkjuː, US 'ɔːtoʊ-/ *noun*
ئۆتۆکیو، دەقنوێن، دەقپیشاندەرە (دەزگایی نزیک بە کامێرا، بۆ ئەو کەسەی کە لەسەر تەلەفزیون قسە دەکا تا بتوانێ بیخوێنێتەوە بێئەوەی لەبەری بکا، teleprompter) ۞ اتوکیو
**auto-da-fé** /ˌɔːtəʊdɑː'feɪ/ *noun*, *pl.* autos-da-fé /ˌɔːtəʊz-/
بڕیاری سووتاندنی جیاباوەڕێ لە لایەن دادگای پشکنینی بیروباوەڕی سپانییەوە، ڕاپەڕاندن یان جێبەجێکردنی بڕیار ۞ اوتودافی، اجرای حکم
**autodidact** /'ɔːtəʊdɪdækt/ *noun*
کەسی خۆفێر (بە خۆی فێردەبێ) ۞ شخص خودآموخته
**autodidactic** /ˌɔːtəʊdɪ'dæktɪk/ *adjective*
خۆفێر ۞ خودآموخته
**autodinamic** *adjective*
خۆدینامیک، خۆداینەمیک ۞ خودپویا
**autodinamicism** *noun*
خۆدینامیزم، خۆداینەمیزم ۞ خودپویایی
**autoecology** /ˌɔːtəʊɪ'kɒlədʒi/ = autecology
**auto-erotic** *adjective*
1 خۆپیتاندن (وەکوو هێندێ کرم) 2 خۆبزوێنەر ۞ اتواروتیک
**auto-eroticism** *noun*
خەریکی خۆبوون، خۆبزواندن، خۆئیرۆتیسیزم ۞ خودکامجویانه
**auto-exposure** *noun*
1 (کامێرا) خۆڕۆشنایی‌پێدان 2 توانایی کامێرایێ بۆ خۆڕۆشنایی‌پێدان ۞ اتواکسپوزر
**autogamic** *adjective*
ئۆتۆگامیک، خۆپیتێن ۞ اتوگامیک
**autogamous** *adjective*
ئۆتۆگامۆس، خۆپیتێن، خۆچاکێن، خۆچاککەر ۞ اتوگاموس
**autogamy** /ɔː'tɒgəmi/ *noun*
ئۆتۆگامی، خۆپیتاندن، خۆچاککردن ۞ اتوگامی
**autogenesis** *noun*
ئۆتۆژنیز، ئۆتۆجێنیسیس، خۆپێکهاتن، خۆپێکهاتی ۞ خودزایی
**autogenic** /ˌɔːtə(ʊ)'dʒɛnɪk/ *adjective*
ئۆتۆجێنیتیک، خۆپێکهاتە، خۆپێکهات ۞ خودزا
**autogenous** /ɔː'tɒdʒɪnəs/ *adjective*
(لکێنگەری یان جۆشکاری) ڕاستەوخۆ ۞ بدون لحیم
**autogeny** *noun*
ئۆتۆجێنی، خۆپێکهاتن، خۆپێکهاتی ۞ خودزایی
**autogiro** *noun*, also autogiro, *pl.* autogiros
خۆسوورە، ئۆتۆجیرۆ ۞ اتوجیرو
**autograft** *noun*
خۆپێوەستی (پێوەست یان متوربەکردنی شانەیێ لە شوێنێ بۆ شوێنێکی تر لە هەمان کەس) ۞ اتوگرافت
**autograph** /'ɔːtəgrɑːf, US -græf/ *noun*
1 ئیمزا، مۆر 2 دەسوخەت 3 دەسنووس 4 بە مۆر یان ئیمزای نووسەرەوە ۞ 1 امضا 2 دستخط 3 خطی 4 با امضای نویسنده
**autographed** *adjective*
مۆرکراو، ئیمزاکراو ۞ امضاشده
**autoimmune** /ˌɔːtəʊɪ'mjuːn, US ˌɔːtoʊ-/ *adjective*
*an autoimmune response* : خۆپارێز ۞ خودایمن (autoimmunization *n*)
**autoimmunity** /ˌɔːtəʊɪ'mjuːn, US ˌɔːtoʊ-/ *noun*
خۆپارێزی ۞ خودایمنی
**auto-intoxication** *noun*
(پزشکی) خۆژاراویبوون، ژاراویبوونی خۆبەخۆ ۞ اتواینتوکسیکاسیون
**autologous** /ɔː'tɒləgəs/ *adjective*
(خانە یان شانە) هەر لەو کەسە بەدەس هاتووە ۞ مشتق از خود
**autolysis** /ɔː'tɒlɪsɪs/ *noun*
(زیندەناسی) تیاچوونی خانە و شانەکان لە لایەن ئەنزیمەکانی خۆیانەوە، هەرسی خۆبەخۆ ۞ اتولیز، اتولیسیس
**autolytic** *adjective*
سەربە autolysis ۞ وابسته به اتولیز یا اتولیسیس
**automaker** /'ɔːtəʊmeɪkə(r), US 'ɔːtoʊ-/ *noun*
کۆمپانی یان ناوکۆیی ماشین(سازی) ۞ شرکت ماشین‌سازی
**automat** /'ɔːtəmæt/ *noun*
خواردنگەی دەزگایی یان کۆینی ۞ اتومات
**automated teller machine (ATM)** = cash machine
**automatic** /ˌɔːtə'mætɪk/ *adjective*, *noun*

*adj* 1 خۆکار، ئۆتۆماتیک، میکانیکی، ماشینی، mechanical: *the answers were automatic* 2 ئینستینکتیف، خۆنەویست، خۆکردوو، ناخودئاگا: *automatic blinking of the eyelids* 3 خۆبەخۆ، لەخۆوە *n* 1 چەکی خۆکار یان ئۆتۆماتیک 2 ماشین بە ترانسمیشنی (گێڕ) خۆکارەوە ◌ *adj* 1 خودکار، اتوماتیک 2 غریزی، غیرارادی 3 خودبەخود *n* 1 جنگ‌افزار اتوماتیک 2 ماشین دنده‌اتوماتیک

**automatically** /-kli/ *adverb*
خۆکارانە، لەخۆوە ◌ به طور خودکار، خودبەخود

**automatic pilot** *noun*, also autopilot
1 فڕۆکەوانی خۆکار یان ئۆتۆماتیک، فڕۆکەوانی دەزگایی یان ماشینی، سیستمێکی مەهاری ئێلیکترۆنی (وەک هی کەشتی، کەشتی ئاسمانی یان فڕۆکە) 2 (be on automatic pilot) دۆخ یان هەڵومەرجێ کە لەودا چالاکی یان هەڵسوکەوتێ خۆبەخۆ بە شێوازێکی خۆنەویستە و ئینستینکتیف و لەوەپێش‌دیاری‌کراو predetermined ڕێک دەخرێ: *I got up and dressed on automatic pilot* ◌ 1 خلبان اتوماتیک 2 اتوماتیک پیلوت

**automatic transmition** *noun*
گێڕی خۆکار یان ئۆتۆماتیک ◌ دنده اتوماتیک

**automatism** /ɔːˈtɒmətɪz(ə)m/ *noun*
خۆکاری، جووڵان یان بزاوتی خۆنەویستە یان خودبەخود (جووڵان یان کارکردنی (ئەندام، شانە یان بەشێکی لەش) بەبێ مەهار و کۆنترۆڵی ئاگادارانە)، کردەوەیێ کە بیر یان نیازێکی ئاگادارانەی لە پشتەوە نەبێ؛ دۆخی خۆکاری، کردەوە یان کردەیێکی لەخۆوە یان خۆکارانە، کارێکی خودبەخود ◌ حرکت غیرارادی: حالت خودکاری، عمل خودبەخود

**automation** /ˌɔːtəˈmeɪʃn/ *noun*
ماشینی‌کردن، خۆکارگێڕی ◌ ماشینی کردن

**automatization** *noun*
خۆکاری، کردنەخۆکار، خۆکاراندن، جووڵان یان بزووتنی خودبەخود ◌ خودکاری، حرکت غیرارادی

**automaton** /ˌɔːtəˈmeɪʃn/ *noun*, *pl.* automata /-tə/ or automatons
1 ماشینی خۆکار 2 مرۆڤی دەزگایی یان ماشینی (یان میکانیکی، کە بەپێی کۆمەڵێ کۆد و دەستووری پێ‌دراو کار دەکا) ◌ 1 ماشین خودکار 2 آدم مکانیکی

**automobile** /ˈɔːtəməbiːl/ *noun*
ماشین، خۆڕەو، ئۆتۆمبیل: *the automobile industry* ◌ خودرو، اتومبیل

**automotive** /ˌɔːtəˈməʊtɪv, US -ˈmoʊ-/ *adjective*
1 سەربە ماشین 2 = self-propelled ◌ وابسته به اتومبیل

**autonomic** /ˌɔːtəˈnɒmɪk/ *adjective*
(کارئەندامناسی) خۆکار، خۆنەویست، سەربە ئەو بەشەی دەزگای دەماری کە بەرپرسە بۆ مەهار و کۆنترۆڵی هەناسە، سووڕانی خوێن، هەرس و ئەرک و فۆنکسیۆنەکانی تری لەش: *autonomic reflexes* (autonomically *adv*) ◌ غیرارادی

**autonomic nervous system** /ˌɔːtənɒmɪk ˈnɜːvəs sɪstəm, US ˌɔːtənɑːmɪk ˈnɜːrvəs/ *noun*
کۆئەندام یان ڕێکخستەی دەماری خۆنەویستە، دەزگای دەماری خۆنەویستە ◌ دستگاه عصبی غیرارادی

**autonomous** /ɔːˈtɒnəməs, US ɔːˈtɑːn-/ *adjective*
1 خۆبەڕێوەبەر، لاسەربەخۆ، خودموختار: *an autonomous republic/state* 2 سەربەخۆ، ئازاد ◌ 1 خودمختار، خودگردان 2 مستقل، آزاد

**autonomously** /ɔːˈtɒnəməsli, US ɔːˈtɑːn-/ *adverb*
خۆبەڕێوەبەرانە، ئازادانە، بە شێوەیێکی خۆبەڕێوەبەر ◌ به طور خودگردان

**autonomy** /ɔːˈtɒnəmi, US ɔːˈtɑːn-/ *noun*, *pl.* autonomies
1 خۆبەڕێوەبەری، لاسەربەخۆیی، سەربەخۆیی نیوخۆیی، خودموختاری 2 سەربەخۆیی، ئازادی: *giving individuals greater autonomy in their own lives* ◌ 1 خودگردانی، خودمختاری 2 استقلال، آزادی

**autooxidant** *adjective*
خۆئۆکسێن ◌ خوداکسنده

**autooxidation** *noun*
خۆئۆکسان ◌ خوداکسایش

**autophagy** *noun*
خۆخۆری ◌ خودخواری

**autophyte** *noun*
ئۆتۆفیت: ئەو گیا و رووەکە خۆرسکانەی کە پێداویستی خۆیان لە عەرزەوە وەردەگرن؛ هەر زیندەوەر یان ئۆرگانیزمێ کە خۆراکی خۆی دروست دەکا ◌ اتوفیت

**autophytic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە ئۆتۆفیتەوە هەیە ◌ وابسته به اتوفیت

**autopilot** = automatic pilot

**autopista** /ˌɔːtə(ʊ)ˈpiːstə, Spanish autoˈpista/ *noun*
پانەڕێ لە ولاتانی سپانیایی‌زماندا ◌ آزادراه

**autoplstic** *adjective*
سەربە خۆپەیوەستی یان خۆمتوڕباندن ◌ وابسته به خودپیوندی

**autoplsty** *noun*

خۆپەیوەستی، خۆمتوربانـدن، خۆپێوەستی: متوربە یـان پێوەست لـە خـۆوە بـۆ خـۆ، نەشتەرگەری بەهۆی لێنان یان پێوەستاندنی بەشێ لە لەشی خۆ بۆ بەشێکی تر ۞ خودپیوندی

**autopolyploid** *noun, adjective*

ئۆتۆپۆلیپلۆئید، خۆپۆلیپلۆئید: کۆمەڵی کرۆمۆزۆمە هاوشێوەکان و چەندبەرامبەربووی زیندەوەرێ، بە شێوەیێ کە هەردوو زنجیرە کرۆمۆزۆمەکە سەربە جۆرێ بن ۞ اتوپلی‌پلوئید

**autopolyploidy** *noun*

ئۆتۆپۆلیپلۆئیدی، خۆپۆلیپلۆئیدی ۞ اتوپلی‌پلوئیدی

**autopsy** /'ɔ:tɒpsi, US 'ɔ:tɑ:psi/ *noun*, also post-mortem, *pl.* autopsies

یەکالاکردنەوە، توێکاری مردوو، لەش‌دانەوە (جەستە و هۆی زانینی مردن) ۞ کالبدشکافی

**autoradiograph** *noun*, also autoradiogram

ئۆتۆرادیۆگراف، خۆتیشکەوێنە(هەڵ)گر: وێنەیێ کە لە ئەنجامی دانانی فیلمی وێنەگری photographic لەبەر تیشک‌دانەوەی ماک و مەتریالی تیشک‌دەرەوە دێتە بەرهەم (یان دەردەکەوێ) ۞ خودپرتونگار

**autoradiographic** *noun*

سەربە ئۆتۆرادیۆگرافی ۞ وابستە بە خودپرتونگاری

**autoradiography** *noun*

ئۆتۆرادیۆگرافی، خۆتیشکەوێنە(هەڵ)گری ۞ خودپرتونگاری

**autoroute** *noun*

(لە فەرەنسی‌یەوە) پانەڕێی فەرەنسی ۞ آزادراه فرانسوی

**autosave** *noun*

(کامپیوتێر) خۆهەڵگرەوە ۞ اتوسیو

**autosexing** *adjective*

خاوەنی تایبەتمەندی رەگەزی جیاواز لە جۆری خۆی یان تایبەتمەندی جیاواز لە دوو رەگەز، لە کاتی بوون یان بەکرکەوتنا بە مەبەستی جیاکردنەوەی نێرەکان لە مێیەکاندا ۞ اتوسکسینگ

**autosomal** *adjective*

سەربە کرۆمۆزۆمی نارەگەزی، سەربە خۆتەن ۞ وابستە بە اتوسوم

**autosome** /'ɔ:təʃəom/ *noun*

کرۆمۆزۆمی نارەگەزی، خۆتەن ۞ اتوسوم، کروموسوم غیرجنسی

**autostrada** /'ɔ:tə(ʊ)ˌstrɑ:də, Italian auto'strada/ *noun*, *pl.* autostradas or autostrade /-deɪ, Italian -de/

پانەڕێی ئیتالیایی، ماشینەڕێ ۞ آزادراه ایتالیایی

**autosuggestibility** *noun*

لەخۆواتێ‌گەیاندن‌هاتوویی ۞ قابلیت تلقین بە نفس

**autosuggestible** *adjective*

لەخۆواتێ‌گەیاندن‌هاتوو، بە خۆ تەلقین دەکرێ ۞ قابل تلقین به نفس

**autosuggestion** *noun*

خۆواتێ‌گەیاندن، بە خۆ تەلقین‌کردن ۞ تلقین به نفس

**autotelic** /ˌɔ:tə(ʊ)'tɛlɪk/ *adjective*

(چالاکی یان کاریکی داهێنەرانە) خاوەنی ئامانج یان مەبەستێ لە خۆیدا، لەخۆیدا مەبەستێکی هەیە ۞ دارای عزم پنهانی

**autotetraploid** *noun, adjective*

ئۆتۆتێتراپلۆئید: کۆمەڵی کرۆمۆزۆمە هاوشێوەکان و چواربەرامبەربووی زیندەوەرێ ۞ اتوتتراپلوئید

**autotetraploidy** *noun*

ئۆتۆتێتراپلۆئیدی ۞ اتوتتراپلوئیدی

**autotomic** *adjective*, also autotomous

1 سەربە خۆبڕی 2 خۆبڕ ۞ وابستە به اتوتومی

**autotomy** /ɔ:'tɒtəmi/ *noun*, *pl.* autotomies

(گیانەوەرناسی) خۆبڕی (فڕێدانی بەشێ لە لەش، ب.ت. کلکی مارمێلکەیێ، لە لایەن گیانەوەرێ لەبەر مەترسی‌یێ) ۞ اتوتومی

**autotoxemia** = autointoxication

**autotoxin** *noun*

خۆژار: ماک یان مەتریالێ کە لە لایەن زیندەوەرێ دروست دەکرێ و بۆ خۆی ژارە ۞ اتوتوکسین

**autotransformer** *noun*

ترانسفۆرمێرێ کە خاوەنی تاکە کۆیلێکە کە هەردوو کۆیلی یەکەم و دووەم دابین دەکا ۞ اتوتوترانسفورمر

**autotransplantation** *noun*

خۆپێوەستی (پێوەستاندنی شانەیێ لە شوێنێ بۆ شوێنێکی، هەر لەو کەسە) ۞ اتوترانسپلانتاسیون

**autotroph** /'ɔ:tə(ʊ)trəʊf, US -trɒf/ *noun*

(زیندەناسی) خۆخۆری (خۆی خواردنی خۆی لە مەتریالە نائەندامی‌یە سادەکان دروست دەکا) ۞ اتوتروف

**autotrophic** *adjective*

سەربە خۆخۆری، سەربە ئۆتۆترۆف ۞ وابستە به اتوتروف

**autoworker** *noun*

کەسێ کە لە پیشەسازی ماشین‌سازی‌دا دامەزراوە ۞ اتوورکر

**autoxidation** /ˌɔ:tɒksɪ'deɪʃ(ə)n/ *noun*

(کیمیا) خۆژەنگ‌هێنان، ژەنگ‌هێنانی خۆبەخۆی مەتریالێ لەبەر بوونی لەبەر هەوادا ۞ اتواکسیواسیون

**autumn** /'ɔ:təm/ *noun, adjective*

*n* 1 پاییز، گەڵاڕێزان، خەزەڵوەر 2 (ئەستێرەوانی) قۆناخی نێوان بەرامبەربوونەوەی

پـایز تـا ڕۆژگـەڕانـەوەی زسـتانی winter solstice *adj* پاییزی، پاییزە ◊ *n* 1 پاییز، خـزان 2 اوتومن *adj* پاییزە

**autumnal** /ɔːˈtʌmnəl/ *adjective*
پـــاییزی، پـــاییزە: *autumnal colours* (autumnally *adv*) ◊ پاییزی

**autumnal equinox** *noun*, also autumnal point
بەرامبەربوونەوە یان ڕۆژگەڕانەوەی پاییزی ◊ اعتدال پاییزی

**autumn crocus** *noun*
گوڵـەپـاییزە، گوڵـەجووتیارە، گوڵـەجـووتیرە، جافەجیلە، شلەجاف [تـوخم *Colchicum*] ◊ گل حسرت، سورنجان

**autunite** /ˈɔːtʌnʌɪt/ *noun*
کانیکی درەوشاوەی زەرد کە فۆسفاتی کالسیۆم و یۆرانیۆمی تیایە $CaU_2P_2O_{12}.8H_2O$ (بنەڕەت: لە *Autun* شارێ لە ڕۆژھەڵاتی فەرەنسە، نزیک بەو سەرچاوەیە + ite[1]) ◊ اوتونیت

**auxiliary** /ɔːgˈzɪliəri/ *adjective, noun* (*pl.* auxiliaries)
*adj* یارمەتیدەرانە، کۆمەکی، یەدەکی، زاپاس، دەزی، پاشکۆیی، زیادی *n* 1 یاریدەدەر 2 کاری یاریـدەدەر 3 (auxiliaries) هێـزی یاریـدەدەر، هێزی پشتیوانی 4 یاریدەدەر، یارمەتیدەر (لە *auxiliarius* لاتـین، لـە *auxilium* "یارمـەتی") ◊ *adj* امدادی، کمکی، فرعی، اضافی *n* 1 معین یا کمکی 2 فعل کمکی یا معین 3 (در جمع) نیـروی امدادی 4 یاور، مدد

**auxiliary cell** *noun*
(زیندەناسی) خانەی یاریدەدەر یان لاوەکی ◊ سلول کمکی

**auxiliary verb** *noun*
کاری یاریدەدەر ◊ فعل معین

**auxin** /ˈɔːksɪn/ *noun*
ئۆکـسین، پـەرین (لـە پـەرەسـەندن + in-) (کەرەسـەیەکی ئەنـدامی کـە پەرەسـەندن یـان هەڵـدانی گیـا و ڕووەک ڕێکدەخـا، ب.ت. لـە ڕەگازۆکردن و پەرە بە هۆرمۆنی ڕووەکی دەدا) ◊ اُکسین

**avadavat** /ˈavədəvat/ *noun*, also amadavat
waxbill یەکـێ سـوور یـان بـۆری ئاسـیای باشووری، جاروبار لە قەفەس دەکرێ [تـوخم *Amandava*: دوو جۆرن] (بنـەڕەت: لـە نـاوی شاری ئەحمـەدئابادی هێنـدەوە گیراوەتـەوە) ◊ نوعی پرنده

**AV** /ˌeɪ ˈviː/ *abbreviation* 1 audio-visual 2 Authorized Version

**avail** /əˈveɪl/ *noun*
قازانج، سوود، کەڵک، مەفا، کاریگەری، بانـدۆر: *effort was of little avail* ◊ فایده، تأثیر

**availability** /əˌveɪləˈbɪləti/ *noun*
هەبوون، زۆری، بەدەستەوەبوون، لەبەردەستابوون، دەس‌پێراگەیشتن، بەردەستی: *the availability of cheap flights* ◊ موجود بودن، دسترسی

**available** /əˈveɪləbl/ *adjective*
زۆر، هەیـە، بەدەسـتەوەبوو، بـەردەسـت، لەبەردەسـت، دەسـکەوتوو، دەسـگیر، دەس‌پێراگەیشتوو، فەراهەم، حـازر، ئامادە، سـاز ◊ موجود، در دسترس، حاضر

**avalanche** /ˈævəlɑːnʃ, US ˈævəlæntʃ/ *noun*
1 ڕنوو، کلێلە، کلیلە، کەویەبەفر، سلخە، شـاپە، شـیپ، هـەرەس، سـیان، ئاشـووت: *alpine villages destroyed in an avalanche* 2 لێشاو، کۆما، لۆدە، کەڵەک: *We received an avalanche of letters in reply to our advertisement* ◊ *office workers tied down with an avalanche of paperwork* 3 (فیزیـک) هـەرەسـە: ڕەوت یـا پرۆسـەیێکـی کەڵـەکەبوو cumulative process کە لەودا ئـایۆن یـان ئێلیکترۆنـەکـان هـی (ئـایۆن یـان ئێلیکترۆن) زیاتر بەهۆی پێک‌کەوتن collision دروست دەکا ◊ 1 بهمن 2 انبوه 3 آوالانش

**avant-courier** *noun*
(لە فەرەنسی‌یەوە) پێشڕەو، پێشەنگ ◊ پیشاهنگ

**avant-garde** /ˌævɒ̃ ˈgɑːd, US ˌævɑ̃ ˈgɑːrd/ *noun, adjective*
*n* پێشەنگان، پێشڕەوەکان *adj* (لە هونەرەکاندا) ڕچەشـکێن، پێـشڕەو، سـەرکێش، پێـشەنگ، سەرجەڵـە: *avant-garde writers* (avant-‌gardism *n*, avant-gardist *n*؛ بنـەڕەت: ئینگلیـسی نێـوەڕاسـت (ئامـاژە بـە پێـشەنگـی سپایێ): لە فەرەنسەوە بە واتای "پێشەنگ") ◊ *n* پیشتازان، پیشگامان *adj* پیشگام، پیشتاز

**avant-propos** *noun*
(فەرەنسی) پێشەکی ◊ مقدمه

**Avar** /əˈvɑː/ *noun*
1 ئەنـدامی گـەلێکی ڕەوەنـدی کـۆنی ناوەنـدی ئاسیا 2 گەلێکی لادێیی Dagestan لە ڕووسیە 3 زمانی کاوکازی باکووری گەلی ئافار ◊ آوار

**avarice** /ˈævərɪs/ *noun*
ماڵپەرستی، تەماح، پیسی، پیسایی، چاوچنۆکی، هەڵپە ◊ حرص، طمع، آز

**avaricious** /ˌævəˈrɪʃəs/ *adjective*
مـاڵپەرسـت، بەتـەماح، چاوبرسی، چـاوچنۆک، پیسکە، بەهەڵـپە، covetous، greed ◊ حریص، طمع‌کار، آزمند

**avariciously** /ˌævəˈrɪʃəsli/ *adverb*
بە تەماحەوە، لە ڕووی تەماح یا چاوچنۆکی‌یەوە، بەتەماحانە، چاوچنۆکانە ◊ حریصانه

**avariciousness** /ˌævəˈrɪʃəsnəs/ *noun*

**backslid** = past and past participle of backslide

**backslider** *noun*
کەسێ کە بۆ سەر رەوشتی جارانی (خراپ) دەگەڕێتەوە ◌ بکسلایدر

**backsliding** /ˈbækslaɪdɪŋ/ *noun*
گەڕانەوە، دانەدواوە، داچوون، رووتێکردنەوە، چوونەوەسەر ◌ برگشت، اُفت

**backspace** /ˈbækspeɪs/ *noun*
کلیلی دوابردنەوە، دوابردە، پاشبردە ◌ بکسپیس

**backstage** /ˌbækˈsteɪdʒ/ *adverb, adjective*
1 پشتەپەردە، لە دواوە یان پشتەوەی پەردە 2 بەنامەکی، بەنهێنی، بە دزییەوە: *backstage diplomacy* ◌ 1 پشت صحنە 2 پنهانی

**backstairs** /ˈbæksteəz, US -sterz/ *noun, adjective, pl.*
*n* پلیکانی پشتەوە *adj* نهێنی، نەهێنی، بەنامەکی، دزەکی: *backstairs deals between politicians* ◌ *n* پلکان عقبی *adj* سری

**backstitch** *noun*
شێوازی درومانێ کە تەقەڵەکان تێکدەبەرن، تەقەڵی چەپوڕاست یان حەوتوهەشت ◌ سوزن پشت سوزن

**back street** /ˈbækstriːt/ *noun, adjective*
*n* 1 لاکۆڵان، ئالوڵە 2 شەقامی هەژارنشین *adj* بەنهێنی، ناقانوونی، لەبنەوە، نایاسایی ◌ *n* 1 کوچە پس کوچە 2 خیابان فقیرنشین *adj* مخفیانە، غیرقانونی

**backstroke** /ˈbækstrəʊk, US -strouk/ *noun*
پشتەمەلێ، پشتەمەلە(ی باسکە) ◌ کرال پشت

**backswimmer** *noun*
پشتەمەلەوان؟: جۆرێ مێرووی ئاوی راوی، لە خێزانی Notonectidae، لەسەر پشت مەلە دەکا ◌ نوعی حشرە

**backsword** *noun*
شمشێری یەکدەمە یان یەکدەم ◌ شمشیر دارای یک دم

**back talk** = backchat

**back-to-back** *adjective, adverb*
پشتبەپشت ◌ پشت‌بەپشت

**back-up** /ˈbækʌp/ *noun, adjective*
*n* پشتیوانی، داکۆکی، کۆمەک، پشتگیری *adj* 1 پشتیوان 2 پشتیوانە (کۆپی‌کردنی فایلێ و هتد کە دەتوانرێ بەکاربێنرێ کاتێ فایلە سەرەکییەکە تیابچێ) ◌ *n* حمایت *adj* 1 کمکی 2 ذخیرە

**backup light** = reserving light

**backward** /ˈbækwəd, US -wərd/ *adjective, adverb*
*adj* 1 پشتەوە، دواوە، بۆ دواوە، بەرەوپاش، بەرەودوا 2 خاو، تەمەڵ، دواکەوتوو، پاشکەوتوو 3 کەمڕوو، شەرمێون *adv* 1 (هەروەها backwards) بۆ پشتەوە، بۆ دواوە، بەرەو پشتەوە، بەرەو دواوە، بەرەوپاش، بەرەودوا، روو لە پشتەوە، بەرەو خراپی 2 ئاوەژوو، سەرەونخوون، پشتەوپاش، پێچەوانە، پاشەوپاش، پشتاوپشت، لە ناخرەوە، لە دواوە ◌ *adj* 1 عقبی، بە عقب، برعکس 2 کند، عقب‌افتادە 3 کم‌رو *adv* 1 بە عقب، بە قهقرا 2 برعکس، وارونە، ازعقب، از آخر

**backward-looking** *adjective*
کۆنەپەرستانە، دواکەوتووانە ◌ واپس‌گرایانە

**backwardness** /ˈbækwədnəs, US -wərd-/ *noun*
دواکەوتوویی، پاشکەوتوویی، جێماوی ◌ عقب‌ماندگی

**backwards** = backward *adverb*

**backwash** /ˈbækwɒʃ, US -wɑːʃ, -wɔːʃ/ *noun*
1 ئەنجام یان ئاکامی تاڵ و ناخۆش 2 پێناژۆ، ئاکام 3 شوێنی کەشتی یان بەلەم (لەسەر ئاو) 4 گەڕانەوەی شەپۆل، پەرچەشەپۆل، پاشەشەپۆل، پاشەپێل 5 قۆناخی دوای، کاتی پاش ◌ 1 نتیجەی نامطلوب 2 نتیجە، پیامد 3 رد قایق یا کشتی 4 برگشت موج 5 زمان پس از

**backwater** /ˈbækwɔːtə(r)/ *noun*
1 بەنگاو، گۆلکاو، گۆلاو، پاشاو 2 دواکەوتوویی 3 لاتەریک، (شوێنی) چەپەک، لاپەڕ ◌ 1 آب راکد 2 عقب‌ماندگی 3 جای دورافتادە

**backwoods** /ˈbækwʊdz/ *noun, adjective, pl.*
*n* 1 شوێنە چەپەکەکان، چەپەکان، لاپەڕان 2 دارستانە چەپەک یان لاپەڕەکان *adj* چەپەک، لاتەریک، لاپەڕ ◌ *n* 1 مناطق دورافتادە 2 جنگل‌های دورافتادە *adj* دورافتادە

**backwoodsman** /ˈbækwʊdzmən/ *noun, pl.* backwoodsmen
لادێیی، دێهاتی، دەشتەکی ◌ روستایی

**backyard** /ˌbækˈjɑːd, US -ˈjɑːrd/ *noun*
1 حەوشەی پشتەوە 2 باخچەی پشتەوە ◌ 1 حیاط خلوت 2 باغچەی عقبی

**bacon** /ˈbeɪkən/ *noun*
بێیکێن، گۆشتی بەراز (برژاو، بۆدراو یان وشکەوەکراو) ◌ ژامبون

**Baconian** /beɪˈkəʊnɪən/ *adjective, noun*
*adj* 1 سەربە فیلسوفی ئینگلیسی سێر فرانسیس باکون Francis Bacon (1561-1626) و فەلسەفەکەی 2 سەربە تیۆرییەکەی 3 سەربەو تیۆرییەی کە پێی وایە شانۆنامەکانی شەکسپیەر لە لایەن باکونەوە نووسراون *n* 1 لایەنگری فەلسەفەی باکونی 2 لایەنگری تیۆری باکونی

 باکونی

**bacteri(o)-** /bak'tɪərɪəʊ/ *prefix*
پێـشگر: بـەکتریا، توولـیژە: *bacteriolysis* (بنەڕەت: لە *baktērion* یۆنانی، چکۆلێنراوی ("rod, cane" *baktēria* ۞ پێشوند: باکتری

**bacteraemia** /ˌbaktə'riːmɪə/ *noun*, US bacteremia
بوونی بەکتریا لە خوێندا ۞ وجود باکتری در خون

**bacteria** = plural form of bacterium

**bacterial** /-rɪəl/ *adjective*
بەکتریایی، سەربە یان پێوەندی بە بەکتریاوە هەیە، بە توولێژە تووش بووە: *bacterial infection* (bacterially *adv*) ۞ باکتریایی

**bactericide** /bæk'tɪərɪsaɪd, US -'tɪr-/ *noun*
(دەرمـان) بـەکتریاکوژی (bactericidal *adj*: بەکتریاکوژ) ۞ باکتری‌کشی

**bacteriochlorophyll** *noun*
سەوزینەی توولێژە (یان میلیژە)، کەسکینەی بـەکتریـا: بـەرهـەمێکی pyrrole لـە بـەکتریـا photosynthetic ـەکاندا کە پێوەندی‌یان بە بەرزە ڕووەکەکانەوە هەیە ۞ باکتری‌کلرفیل

**bacteriocin** *noun*
باکتریۆسین: ئانتی‌بیوتیکێ (وەک colicin) کە لە لایەن بەکتریاکانەوە بەرهەم دێنرێ ۞ باکتریوسین

**bacteriogenic** *adjective*
پێکهاتوو بەهۆی بەکتریاوە، بەهۆی بەکتریاوە ۞ باکتریوژنیک

**bacteriol.** = bacteriology

**bacteriological** /bækˌtɪərɪə'lɒdʒɪkl, US -ˌtɪrɪə'lɑːdʒ-/ *adjective*
بەکتریاناسی‌یانە، سەربە یان پێوەندی بە بەکتریاناسی‌یەوە هەیە ۞ باکتری‌شناختی

**bacteriologist** *noun*
بەکتریاناس ۞ باکتری‌شناس

**bacteriology** /bækˌtɪərɪ'ɒlədʒɪ, US -ˌtɪrɪ'ɑːl-/ *noun*
بەکتریاناسی؛ ژیان و دیاردەی بەکتریایی ۞ باکتری‌شناسی

**bacteriolysis** *noun*
فەوتان یان تیاچوونی خانە بەکتریایی‌یەکان ۞ باکتریولیز

**bacteriolytic** *adjective*
سەربە فەوتان یان تیاچوونی خانە بەکتریایی‌یەکان، تاودەری تیاچوونی بەکتریا یان خانە بەکتریایی‌یەکان ۞ وابستە بە باکتریولیز

**bacteriophage** /bak'tɪərɪə(ʊ)feɪdʒ, US -fɑːʒ/ *noun*, also phage
بەکتری‌خۆر، بەکتریاخۆر، بەکتریاکوژ، ڤایرۆسی بەکتریا، توولێژەخۆر ۞ باکتری‌خور

**bacteriophagic** *adjective*, also bacteriophagous
بەکتری‌خۆر، بەکتریاخۆر، بەکتریاکوژ ۞ باکتری‌خور

**bacteriophagy** *noun*
بەکتری‌خۆری، بەکتریاخۆری، بەکتریاکوژی ۞ باکتری‌خوری

**bacteriorhodopsin** *noun*
جۆرێ پرۆتینی ئەرخەوانی‌ڕەنگ کە لە پەردەی دەرەوەی بەکتریایێ دۆزراوەتەوە (*Halobacterium salinarium* syn. *H. halobium*) و وزەی رووناکی دەگۆڕێ بۆ وزەی کیمیایی لە پێکهاتنی ATP دا، ئاوێتەیێکی پرۆتینی کە retinal ی تیایە و لە لایەن halobacteria ـەوە بۆ ڕۆشنەپێکهاتن لە جیاتی کلۆرۆفیل بەکاردێنرێ ۞ باکتروردوپسین

**bacteriosis** *noun*
بەکتریابردوویی: هەر نەخۆشی‌یێکی بەکتریایی ڕووەک ۞ باکتروز

**bacteriostasis** *noun*
ڕاگرتنی هەڵدانی بەکتریاکان بێ ئەوەی لەنێوبچن، بەکتریاوێستێنی ۞ باکتروستاز

**bacteriostat** /bak'tɪərɪə(ʊ)stat/ *noun*
مەتریالی ڕاگرتنی هەڵدانی بەکتریاکان بێ‌ئەوەی لەنێوبچن، بەکتریابەند، بەکتریاوێستێن ۞ باکتروستات

**bacteriostatic** *adjective*
سەربە bacteriostasis (bacteriostatically *adv*) ۞ وابستە بە باکتروستاز

**bacteriotoxin** *noun*, also bacterial toxin
ژار یا ژاراوکی بەکتریا یا میکرۆب ۞ سم باکتری

**bacteriotropin** *noun*
بەکتریۆترۆپین: ماکێ لە سیرۆمی خوێندا کە زیان بە بەکتریاکان دەگەیێنێ ۞ باکتریوتروپین

**bacterium** /bak'tɪərɪəm/ *noun*, *pl.* bacteria /-rɪə/
بەکتریا، توولێژە، میلۆکە، میلۆچکە، میلیژە (بنەڕەت: لاتینی نوێ، لە *baktērion* یۆنانی، چکۆلێنراوی *baktēria* "cane ,rod" (چونکو ئەوانەی هەوەڵ دۆزرانەوە بە شێوەی میل و توول وابوون) ۞ باکتری، ترکیزە

**bacteriuria** *noun*, also bacteruria
بوونی بەکتریاکان لە میزدا ۞ باکتریوریا

**bacterization** *noun*
بەکتریاندن، بەکترین، بەبەکتریابوون ۞ ترکیزەشدگی، باکتریزاسیون

**bacteroid** *adjective*, also bacteroidal
بەکتری‌ئاسا، شێوەبەکتریا، بەکتریایی ۞ باکتری‌مانند

**Bactrian** /'baktrɪən/ *noun*, *adjective*
*n* 1 دووکۆپارە، جووت‌کۆپارە، دوومل‌ک

2 (Bactrian camel وشـــتری دووکۆپـــاره) دانیشتووی رەسەنی باکتریا Bactria، ناوچە و ئیمپراتۆرییەکی کۆن لە ئاسیای ناوەندیدا *adj* 1 *n* ۞ سـەربە و ناوچەیـە یـان دانیشتووانی دوکوهانه 2 اهل باختر *adj* باختری. باکتریایی

**baculiform** *adjective*

بەکتریائاسا، سامیل، میل‌ئاسا، باسیل‌ئاسا ۞ میلیزه‌مانند. باکتریامانند

**baculovirus** /ˈbakjʊlə(ʊ)ˌvʌɪrəs/ *noun*

(زیندەناسـی) میلۆڤـایرۆس، میلۆڤـیروس، باکولوڤیرۆس ۞ باکولوویروس

**bad** /bæd/ *adjective, adverb, noun*

*adj* 1 خـراپ، بـەد، بـەو، دژ، نـەباش، چـەپ، ناحەز، ناپەسند، ناشیرین، کریت، ناخۆش، ترسناک 2 کەم، ناتەواو، بەش‌نەکردوو 3 لاواز، گەنیو، پیس، رزیو 4 موزیر، بەوەی، خراپ، بەزەر، بەزیان 5 سەخت، توند 6 ناشی، نالەبار، نابار، هەڵەشـە 7 هاروهـاج، بەدفـەر، شـلوق، لاسـار، شـەیتان، نـەگونجاو، بێجـێ، پـڕگرفت، پڕناستەنگ 8 هەڵە، شاشی، چەوت، نادروست 9 بەئێش، بەژان 10 نـەخۆش، ناساخ، ناساز 11 بێ‌نرخ، قەڵب، هیچ‌نەکردوو، ساختە، چروک، بەکارنەهاتوو (کۆین) *adv* خراپ، شپرزە، زۆر *n* خراپی (badness *n* ;baddish *adj*) ۞ *adj* 1 بـد، خبـث، زشـت، ناشایـسـت، نکوهیـده، ناخوشـایند، نـامطبوع، وحـشتناک 2 غیرکـافی 3 خراب، ضعیف، فاسد، گندیـده 4 مـضر 5 سـخت، شـدید 6 نابـاب، پلیـد، ناشـی 7 نُخـس 8 غلـط 9 دردناک 10 مـریض 11 تقلبی، بی‌ارزش (سـکه) *adv* بد، خیلی *n* بدی

**badass** *noun, adjective*

*n* کەسـێکی لاجـلەو یـان شـەڕان‌خـوو *adj* 1 توندوتیژ، شەڕان‌خوو 2 زۆرباش، یەکجار چاک ۞ *n* آدم سـتیزه‌جـو *adj* 1 خـشن، سـتیزه‌جـو 2 خیلی خوب

**bad blood** *noun*

رقەبەرایـەتی، کینەبەرایـەتی، دوژمنایـەتی ۞ خصومت

**bad cheque** *noun*

چەکی تیانەبوو یان خاڵی، چەکی بێ‌مەحەل ۞ چک بی‌محل

**bad debt** *noun*

قەرزی سووتاو یان خوراو، قەرزی تیاچوو یان چوو (لەوە ناچێ بدرێتەوە) ۞ بدهی سوخته‌شده

**baddy** /ˈbædi/ *noun*, also baddie, *pl.* baddies

مرۆی خراپ، کەسێتی یان کەسایەتی خراپ (لە فیلم، شانۆ و کتێب و...) ۞ آدم بـد، شخـصیت منفی

**bade** /beɪd, US bæd/ = past of bid

**bad faith** *noun*

بەدبڕوا، بەدئیمان، لائیمان، بێ‌ئیمان، کەج‌ئیمان ۞ بدایمان

**badge** /bædʒ/ *noun*

نیشانە، دروشم، نارم، بەرزەنگ، یافتە، درف، پلاک، هێما، نموونە: *he converts the macho stereotype into a badge of honour* ۞ پلاک، علامت، نشانه، نماد، مظهر

**badger** /ˈbædʒə(r)/ *noun*

چالەکە، چوالوو، کورەبەش، تژی، کوربەشە، گۆرهەڵکەنە، گۆڕهەڵتەکێنە، لە خێزانی weasel [*Meles meles* (ئوراسیا) و *Taxidea taxus* (ئەمریکای باکووری)] ۞ گورکن، رودک

**badinage** /ˈbædɪnɑːʒ, US ˌbædənˈɑːʒ/ *noun*

(لـە فـەرەنسی، وێـژەیـی) شـۆخی، حەنـەک، سۆحبەت، جەفەنگ، banter ۞ مزاح، مطایبه

**badlands** /ˈbædlændz/ *noun, pl.*

1 بـەوبوو، بـەدبووم، وشـکارۆ، زەوی رووتـەن، وشـکار، رووتـەزەوی 2 (the Badlands) ناوچەیـەکی بـەربلاو لـە رۆژاوای ئـەمریکا ۞ بدبوم

**bad language** *noun*

قسەی پیس، جنێو، سخێف، قسەی ساردوسووک ۞ دشنام، فحش

**badly** /ˈbædli/ *adverb* (worse, worst)

بەتوندی، توند، شپرزە، زۆر، گەلێ، یەکجار، خراپ، بەشێوەیەکی خراپ: *badly organized* ◊ *-ly designed* ۞ به شدت، خیلی، به نحو بدی

**badly off** *adjective*

هـەژار، نـەدار، دەس‌تـەنگ، دەس‌کـورت ۞ تهی‌دست، فقیر

**badminton** /ˈbædmɪntən/ *noun*

بەدمینتۆن (بنەڕەت: لە ناوی *Badminton* (لە باشـووری رۆژاوای ئینگلتـەرە)، کۆشـک یـان بنکـــەیێکـــی دوکـــی Beaufort لـــە Gloucestershire، جێگایێ کە یەکەم جار ئەو کایە کرا) ۞ بدمینتون

**bad-tempered** *adjective*

بـەدخوو، بەدڕەفتار، بـەدفەر، ناجسن، رووتاڵ: *He sat in bad-tempered silence* (bad-temperedly *adv*: بەدخووانـە، بەدڕەفتارانـە، بەدفەڕانە، رووتاڵانە) ۞ بداخلاق، بدعنق

**bad word** *noun*

قسەی پیس، جنێو، سخێف، قسەی ساردوسووک ۞ ناسزا، فحش

**Baedeker** /ˈbeɪdɪkə, German ˈbɛːdəkɐ/ *noun*

کتێبی رێنیشـاندەر (بۆ گەڕوانـەکان، لە لایـەن بلاوکەرەوەی ئەلمانی کارل بـەیدیکێر Karl Baedeker (1801–59)) ۞ راهنما

**baffle** /ˈbæfl/ *noun*

شەپۆل‌بەست، شەپۆل‌بەند، پەردە، پێلگر، بەربەست، نەهێڵەشەپۆل، دەزگا یان کەرستەیێ بۆ دابین‌کردنی رژانی شلە، گاز یان ماک و مەتریاڵی شل یان بۆ بەرگرتن لە بڵاوبوونەوەی دەنگ و رووناکی لە ئاست یان لا و رێڕەوێکی تایبەتی‌دا ◌ موج گیر، بافل

**bafflegab** /'baf(ə)lgab/ *noun*
(نافەرمی) زمانی لێ‌تێنەگەیشتوو یا تێکەڵ‌وپێکەڵ ◌ زبان غیرمفهوم

**bafflement** /'bæflmənt/ *noun*
سەرلێ‌شێوان، گێژی، کاسی، تاسان، سەرسوورمان، سەرسامی: *His reaction was one of bafflement* ◌ سردرگمی، گیجی، حیرت

**baffling** *adjective*
سەرلێ‌شێوێن، گێژکەر: *Some of the country's customs are baffling to outsiders* (bafflingly *adv*) ◌ سردرگم‌کننده

**BAFTA** *abbreviation* /'baftə/, British Academy of Film and Television Arts
ئاکادیمی فیلم و تەلەفزیۆنی بریتانیا ◌ آکادمی فیلم و تلویزیون بریتانیا

**bafta** /'bɑːftə/ *noun*, also baft
جۆرێ کوتاڵی زبر، زۆرتر کەتانی (لە *bāft* ی "فارسی") ◌ بافته

**bag** /bæg/ *noun*
1 جانتا، هەمانە، توورەکە، هەگبە، کیس، کیسە، جزدان، ساک، کیف، جەواڵ، هۆر؟، خورج، تیوەرە، تیر، دەڵق، پاکەت: *a plastic/polythene/paper bag* 2 بری جێ‌بوونەوە 3 راو، نێچیرەوانی: *We got a good bag today* 4 (bags) بڕ یان ژمارەیەکی زۆر: *Get in! There's bags of room* 5 ماس، با (ژێرچاو، بێ‌خەوی یا لەبەر پیری): *bags under the eyes*؛ هێزەڕۆن، خێگەڕۆن skin (bag ◌ 1 کیف، ساک، کیسه، پاکت، توبره، خورجین 2 مقدار گنجایش 3 شکار 4 (در جمع) تعداد یا مقدار زیاد 5 پف

**Baganda** /bə'gandə/ *noun, pl.* sing. Muganda
گەلێکی ئەفریکایی مەڵبەندی Buganda، ئێستا بەشێکە لە یوگاندا ◌ باگاندا

**bagasse** /bə'gas/ *noun*
تڵتەی قامیشی شەکر، قامیشی شەکری هەڵگلۆفراو ◌ تفاله‌ی نیشکر

**bagatelle** /ˌbægə'tel/ *noun*
1 باگاتێل: جۆرێ یاری، شێوەی بیلیارد دەدا 2 شتی ناگرنگ و هیچەکە، هیچ، کاری ناگرنگ یان ئایەخ 3 پارچە موسیقایەکی کورت ◌ 1 باگاتل 2 چیز جزئی 3 (موسیقی) قطعه‌ای کوتاه

**bagel** /'beɪgl/ *noun*
بێی‌گیل، نانی ئاڵقەیی، نانی خڕ، خڕەنان (لە Yiddish *beygel*) ◌ باگل

**bagful** *noun, pl.* bagfuls
(پڕ)توورەکەیێ، (پڕ)کیسەیێ، هەگبەیێ ◌ بە اندازه‌ی یک کیسه

**baggage** /'bægɪdʒ/ = luggage

**baggage car** = luggage car

**baggage room** = left-luggage office

**bagging** *noun*
پارچەیێ بۆ دروست‌کردنی توورەکان، پارچەیی توورەکەیی ◌ باگینگ

**baggy** /'bægi/ *adjective* (baggier, baggiest)
1 هەراو، دەلەب، فش، گوشاد، نەتەنگ، توورەکەیی، توورکەئاسا، داهۆر: *a baggy T-shirt* ◊ *baggy trousers* 2 چۆکداو (شەڵوار): baggily /'bægɪli/ *adv*: داهۆرانە، بەشێوەیەکی فش و گوشاد، هەراوانە؛ bagginess /'bæginəs/ *n*: هەراوی، داهۆری، دەلەبی، فشی، گوشادی) ◌ 1 گشاد، گل و گشاد 2 زانو انداخته

**bag lady** *noun*
(نافەرمی) ژنی سەرلێ‌شێواو یا بێ‌ماڵ‌وحاڵ، دەربەدەر ◌ زن آواره

**bag lunch** = packed lunch

**bagman** *noun, pl.* bagmen
1 فرۆشیاری گەڕۆک 2 (ئەوستراڵیا) ژنی قەحبە 3 (کەنەدی) پارەتی کۆکەرەوەی سیاسی ◌ 1 فروشنده‌ی سیار 2 زن فاحشه 3 باگمن

**bagnio** /'bɑːnjəʊ, US 'banjəʊ/ *noun, pl.* bagnios
1 (مێژوویی، لە رۆژهەڵاتی دوور) بەندیخانە، زیندان 2 قەحبەخانە ◌ 1 زندان 2 فاحشه‌خانه

**bagpipes** /'bægpaɪps/ *noun, pl.*, also pipes
مەشکە(نایە)، هەمبانە، بەگ‌پایپس (ئامێرێکی موسیقایە) ◌ نی‌انبان

**ba gua** /bɑː 'gwɑː/ *noun*, also pa kua
1 با گوا: موتیفێکی دینی چینی 2 جۆرێ هونەری شەڕی چینی ◌ با گوا

**baguette** /bæ'get/ *noun*, also French loaf, French stick
1 نانی باگێت، نان‌بەگێت (هی فەرەنسە) 2 (بیناسازی) جورێ نەخشی گەچی moulding چکۆلەی نیمچەبازنەیی 3 گەوهەرێ ب.ت. ئەلماس، بە شێوەی لاکێشە (ی درێژ) 4 جوری کیفی ژنانەی لاکێشەیی بەندکورت ◌ 1 نان باگت 2 ابزار فتیله‌ای 3 و 4 باگت

**bagworm** *noun*
کرمی (مێرووی) مۆریانە یان پەپوولەی شەوگەڕ، هەگبەکرم؟ [خێزان Psychidae] ب.ت. یەکێ (*Thyridopteryx ephemeraeformis*) کە بەلای دارە گەلاڕێز یان هەمیشەسەوزەکانی

ڕۆژهەڵاتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە ۞ کرم موریانە یا پروانە

**bah** /bɑː/ *interjection*

ئەهـ (بۆ دەربڕینی بێز و بێزاری disdain یان contempt) ۞ آه

**Baha'i** /bɑːˈhɑːi/ *noun*, also Bahai, *pl.* Baha'is

1 بەهایی (دامەزراو لە سەدەی 19دا، پێداگیری لەسەر یەکێتی گەوهەری مرۆڤ و هەموو دینەکان و گەران بە دوای ئاشتی جیهانی) 2 لایەنگری باوەڕی بەهایی ۞ بهائی

**Baha'ism** /bɑːˈhɑːɪz(ə)m/ *noun*

بەهاییباوەڕی (بنەڕەت: لە *bahā'* عەرەبی "splendour") ۞ بهائی‌گرایی

**Bahamian** /bəˈheɪmɪən/ *noun, adjective*

*n* خەڵک یان دانیشتووی باهاماز، باهامایی *adj* باهامایی ۞ باهامایی

**Bahasa Indonesia** /bəˈhɑːsə/ *noun*

زمانی فەرمی ئیندۆنیزیا ۞ زبان رسمی اندونزی

**Bahasa Malaysia** *noun*

زمانی فەرمی مالیزیا ۞ زبان رسمی مالزی

**Bahia grass** *noun*

(ڕووەکناسی) جۆرێ گیای چەندساڵەی گەرمێنانی ئەمریکا، لە ئەمریکای باشووری وەک مێرگ بەکاردێنرێ [*Paspalum notatum*] (*Bahia* هەرێمێکی بریزیل) ۞ نوعی گیاه

**Bahraini** /bɑːˈreɪni/ *noun, adjective*

*n* خەڵکی بەحرەین *adj* سەربە بەحرەین یان خەڵکەکەی ۞ بحرینی

**baht** /bɑːt/ *noun, pl.* same

یەکەی بنەڕەتی پارەی تایلەند، بەرامبەر بە سەد satang ۞ بات

**Bahutu** = plural form of Hutu

**bail**[1] /beɪl/ *noun*

1 بارمتە، دەستەبەرانە، دەستەبەری، زەمانەت 2 کەفیل، دەستەبەر، زامن 3 بەردان یان ئازادبوون بە دانانی دەستەبەر (نامە) ۞ 1 وجه‌الضمان، ضمانت 2 ضامن 3 آزادی به قید ضمانت

**bail**[2] /beɪl/ *noun*

1 دەسک، قوڵف (کتری و هتد) 2 کەمە، تاسمە، دەور یان گەوی دەوری کۆس 3 سەتڵ، دۆلکە ۞ 1 دسته 2 حلقه‌ی دور چلیک 3 سطل

**bailable** *adjective*

بەردەبێ بە دانانی دەستەبەر(نامە)، شیاوی بەردان یان ئازادبوون بە دانانی دەستەبەر(نامە) ۞ قابل آزاد شدن به قید ضمانت

**bail bond** *noun*

دەستەبەرنامە، زەمانەتنامە ۞ ضمانت‌نامه

**bailee** /beɪˈliː/ *noun*

(ماف) پێسپێردراو، ئەسپاردەگر ۞ تحویل‌گیرنده

**bailer** *noun*

1 سەتڵ، هەڵگوێزە، ئاوهەڵگوێز، ئاودەرکێش (شت یان کەسێ کە ئاوی ناو کەشتی دەردەکێشێ) 2 دەسکساز ۞ 1 بایلر 2 دسته‌ساز

**bailey** /ˈbeɪli/ *noun, pl.* baileys

شوورەی قەڵا، حەوشەی پشتەوەی شوورەی قەڵا، حەوشەی دەوردراو بە شوورە ۞ باروی قلعه، حیاط پشت باروی قلعه

**Bailey bridge** *noun*

پردی کاتی (و جوولـۆک، ب.ت. هێزە چەکدارەکان بەکاری دێنن، بنەڕەت: شەڕی جیهانی دووهەم، لە ناوی ئەندازیاری ئینگلیسی سێر *D. Bailey*) ۞ پل موقتی

**bailie** /ˈbeɪli/ *noun, pl.* bailies

(مێژوویی) فەرمانبەری شارەوانی یا لادادپرس لە سکاتلەند ۞ کارمند شهرداری یا قاضی دادگاه بخش اسکاتلند

**bailiff** /ˈbeɪlɪf/ *noun*

1 ئەفسەری قانوون یان یاسا 2 دەرگاوانی دادگا 3 کوێخا 4 فەرمانبەری پاراستنی ڕێکوپێکی دادگا 5بەڕێوەبەری زەوی‌زار (کەسێکی دامەزراو، کێڵگەگێڕ (bailiffship *n*؛ بنەڕەت: لەسەر بنەمای *bajulus* لاتین "manager ،carrier") ۞ 1 پلیس قضایی 2 ضابط دادگستری 3 مباشر 4 مأمور حفظ نظم دادگاه 5 بایلیف

**bailiwick** /ˈbeɪlɪwɪk/ *noun*

1 ناوچە یان دەسەڵاتی bailiff یان bailie 2 (نافەرمی) بوار، پانتایی، مەڵبەند ۞ 1 بایلویک 2 حوزه، گستره

**bailment** /ˈbeɪlmənt/ *noun*

(ماف) بەردان بە دانانی دەستەبەرنامە ۞ آزادی به قید ضمانت

**bailor** /beɪˈlɔː/ *noun*

(ماف) پێ‌سپێر، (ڕا)سپاردەدانەر ۞ تحویل‌دهنده

**bailout** /ˈbeɪlaʊt/ *noun*

پەڕین یان بازدان بە چەترەوە، چەترەبازی ۞ پرش با پاراشوت

**bailsman** /ˈbeɪlzmən/ *noun, pl.* bailsmen

دەستەبەر، کەفیل، زامن ۞ ضامن

**Baily's beads** *noun*

(ئەستێرەوانی) مووروو یان دەنکەکانی بایلی (بنەڕەت: لە ناوی ئەستێرەوانی ئینگلیسی Francis *Baily* (1774-1844)) ۞ بایلی بیدز

**Bairam** /bʌɪˈrɑːm/ *noun*

هەریەک لە دوو جەژن و فێستیڤاڵی ساڵانەی موسڵمانان، بایرامی گەورە لە کۆتایی ساڵی ئیسلامی و بایرامی چکۆلە لە دوایی ڕەمەزان ۞ بایرام

**bairn** /beən, US bern/ *noun*

منداڵ، منداڵ، فرزەند، زارۆک (زۆرتر لە سکاتلەند و ئینگلیسی باکووری، ئەڵمانی

بنەرەت) ۞ کودک

**bait** /beɪt/ *noun*

1 چەشـکە، تامـک، چەشـە، دان، دانـە: *Live worms are used as bait* 2 داو، تەڵـە: *The police used him as bait to trap the killers*
۞ 1 طعمە، چشتە 2 دام

**baiza** /'bʌɪzɑː/ *noun, pl.* same or baizas

یەکەی پارەی عۆمان، بەرامبەر بە سەدیەکی rial
۞ بایزا

**baize** /beɪz/ *nound*

چۆغە، مارت (پارچە، ب.ت. بۆ داپۆشینی میزی بیلیارد و...) ۞ ماهوت

**Bajan** /'beɪdʒ(ə)n/ – *adj & n* informal term for Barbadian

**bake** /beɪk/ *noun*

لێنان، کردن، پێوەدان، برژان، پێژان؟ (ئەڵمانی بنەرەت) ۞ پخت

**baked** *adjective*

لێنراو، برژاو، پێژراو، سوورەوەکراو، سوورۆکراو، پێوەدراو ۞ پختە

**baked Alaska** /ˌbeɪkt ə'læskə/ *noun*

جۆرێ دێسێر کە لە کەیک و بەستەنی دروست دەبێ و بە meringue داپۆشراوە ۞ نوعی دسر

**baked beans** *noun, pl.*

پاقلەی قوتووکراو ۞ کنسرو لوبیا

**bakehouse** /'beɪkhaʊs/ – bakery

**Bakelite** /'beɪkəlaɪt, US 'beɪkl-/ *noun*

بێکلیت (جۆرێ پلاستیکی رەقی قاوەیی تۆخ)
۞ باکلیت

**baker** /'beɪkə(r)/ *noun*

نانەوا، تەنوورەوان، تەنوورەڤان ۞ نانوا

**baker's dozen** *noun*

سێزدە، سیازدە، سێزدە دانە ۞ سیزدە، سیزدە عدد

**bakery** /'beɪkəri/ *noun, pl.* bakeries, also bakeshop

نانەواخانە، نانەوایی، سەرتەنوور ۞ نانوایی

**bakeshop** /'beɪkʃɒp, US -ʃɑːp/ = bakery

**baking** /'beɪkɪŋ/ *noun, adjective,* also baking hot

*n* لێنـان، کـردن، پێـژان، دروسـت کـردن (نـان، کەیک و هتد): *adj a baking dish/tin* یەکجار گـەرم، سـووتێنەر، پرووکێنـەر ۞ *n* پخـت *adj* سوزان

**baking flour** = self-raising flour

**baking powder** *noun*

هـەوێن، گـەردەی هـەوێن، ئامیـان، گـەردە یـا هاراوەی نانکردن ۞ پودر مخمر

**baking soda** = sodium bicarbonate

**baking tray** *noun*

کەشەفی لێنان ۞ سینی پخت

**baklava** /'bɑːkləvə, US 'bak-/ *noun*

(لە تورکییەوە) جۆرێ دێسێری رۆژهەڵاتی نێوەڕاست ۞ باکلاوا

**baksheesh** /ˌbæk'ʃiːʃ/ *noun*

خێر (= لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا، لە *bakšīš* ی "فارسی") ۞ صدقە

**BAL** *abbreviation* British Anti-Lewisite = dimercaprol

**Balaam** *noun,* Greek, from Hebrew *Bil'ām*

بیلعەم، بەلعەم، بالیم: پێغەمبەرێکی پەیمانی کۆن
۞ بلعم

**balaclava** /ˌbælə'klɑːvə/ *noun,* also balaclava helmet

بەلاکلاڤا (= جۆرێ کڵاوی داڕینە کە سەر و مل و دەموچـاو دادەپۆشـێ، لـە نـاوی دێـی *Balaclava* لە کریمیە Crimea) ۞ بالاکلاوا

**balafon** /'baləfɒn/ *noun*

xylophone یکی گەورە، هی موسیقای رۆژئاوای ئەفریکا ۞ بالافون

**balalaika** /ˌbælə'laɪkə/ *noun*

بەلەلـەیکا (سـازێکی موسـیقایی شـێوەگیتار و سێگۆشـە، دوو، سـێ یـا چـوار ژێی هەیـە و لـە وڵاتـانی سـلاڤ و ب.ت. رووسـیە بـاوە) ۞ بالالایکا

**balance** /'bæləns/ *noun,* bal abbreviation balance

1 هاوسـەنگی، هاوکێـشی، لەنگـەر، تـەرازی، تەرازمـەندی، مـیزانی، تـەرازێتی، هاوتـەرازی 2 هاورێکی، کۆکی، گونجان: *This newspaper maintains a good balance in its presentation of different opinions* 3 پاشـماوە، باقی، سەرباقی 4 تەرازوو 5 (هەروەهـا balance wheel) لەنگەرە، لیزۆک (سـەعات) 6 جەر، کۆک، جەری میزان ۞ 1 تـوازن، تعـادل، موازنە 2 هماهنگی 3 بقیە، ماندە 4 ترازو 5 رقاصک 6 کوک

**the balance beam** = beam

**balance budget** *noun*

دراونامـە یـان بودجـەی هاوسـەنگ ۞ بودجـەی متعادل

**balanced** /'bælənst/ *adjective*

1 هاوکێش، هاوسەنگ، هەڤسـەنگ، تەرازمـەند، دانگ، کێشراو، تەراز، میزان 2 هاورێک، گونجاو
۞ 1 متوازن، متعادل 2 هماهنگ

**balanced sentence** *noun*

رستەی هاوکێش یان هاوتا ۞ جملەی متوازن

**balance diet** *noun*

پارێزی هاوسەنگ ۞ رژیم غذایی متعادل

**balanced reaction** *noun*

کاردانەوەی هاوسەنگ(کراو) ۞ واکنش موازنەشدە

**balanced state** *noun*

(کیمیا) بار یان دۆخی هاوکێش یان هاوسەنگ

⟐ حالت متوازن

**balance of payment** *noun*
هاوسەنگی پێدانەکان یان پارەدانەکان ⟐ موازنەی پرداختها

**balance of power** *noun*
هاوکێشی هێز، هاوسەنگبوونی هێز، تەرازووی هێز ⟐ موازنەی قدرت

**balance of trade** *noun*
هاوسەنگی کارداری یان بازرگانی ⟐ موازنەی تجاری

**balance sheet** *noun*
نامەی هاوسەنگی، هاوسەنگی‌نامە، تەرازنامە ⟐ ترازنامە، میزانیە

**balance wheel** *noun*
لەنگەرە، لیزۆک، چەرخی هاوسەنگی (سەعات) ⟐ رقاصک

**balancing act** *noun*
کارسازی (پرۆسەیێ کە لەودا کەسێ هەوڵ دەدا تا دووان یان زیاتر یان گروپێ قایل بکا کە کۆمەڵە شتێکی جیاوازیان دەوێ) ⟐ بالانسینگ اکت

**balander** /bəˈlandə/ *noun*, also balanda
(سووکانە، لەنێو رەسەن یان سەرەتانشینەکانی ئەوستراڵیادا) پیاوی سپی‌پێست (گۆڕاوی "Dutchman" Hollander) ⟐ مرد سفیدپوست

**balanitis** /ˌbaləˈnʌɪtɪs/ *noun*
ماسینی سەلکەکیر، سەلکەماسێ glans penis ⟐ آماس حشفە

**balas ruby** /ˈbaləs/ *noun*
یاقووت یا لالی بەدەخشان (لە *Badakšān*ی ئەفگانستان) ⟐ لعل بدخشان

**balata** /ˈbalətə, US bəˈlɑːtə/ *noun*
دارێکی گەرمێنانی ئەمریکا کە بەرێکی خۆراکی دەگرێ و latex بەرهەم دێنێ [*Manilkara bidentata*] ⟐ بالاتا

**balboa** /balˈbəʊə/ *noun*
یەکەی بنەڕەتی پارەی پاناما، بەرامبەر بە سەد centesimo (بنەڕەت: لە ناوی دۆزەرەوەی سپانیایی *Balboa* Vasco Núñez de) ⟐ بالبوا

**balbriggan** /balˈbrɪg(ə)n/ *noun*
جۆرێ کوتاڵی کەتانی، جاران بۆ جلی ژێرەوە و گۆرەوی بەکاردێنرا (بنەڕەت: لە ناوی شاری *Balbriggan*ی ئیرلەند، لەوێ دەکرا) ⟐ نوعی پارچە

**balconied** *adjective*
(خانووبەرە و هتد) خاوەنی باڵکۆن، بانجیلەدار ⟐ دارای بالکن

**balcony** /ˈbælkəni/ *noun, pl.* balconies
1 بەرهەیوان، بانجیلە، هەواڵە، باهۆ 2 (لە تیاتر یان سینەما) باڵکۆن، بالاخانە، لۆژی سەرێ (بنەڕەت: لە *balcone* ئیتالیایی) ⟐ بالکن

**bald** /bɔːld/ *adjective*
1 تاس، کەچەڵ، کەل، بێ‌قژ، رووتاوە، بێ‌تووک 2 (گیانەوەر) گەڕۆڵ 3 رووتاو، بێ‌گەڵا، رووتەن 4 وشک، بێ(گژ)گیا 5 (تایە) خوراو، شەقڵ‌نەماو، سوواو، لووس، ساف 6 سادە، بێ‌پەردە، ئاشکرا، لەڕوو، بێ‌پەردە، بێ‌شێلەوبێلە (balding /ˈbɔːldɪŋ/ *adj*: رووڵەتاسێ؛ baldly /ˈbɔːldli/ *adv*؛ baldish *adj*: قسەلەڕوو، ئاشکرا، بێ‌پەردە، قسەلەڕووانە؛ baldness /bɔːldnəs/ *n*) ⟐ 1 تاس 2 گر (حیوان) 3 بی‌برگ، لخت 4 خشک، بی‌گیاه 5 سائیدە 6 سادە، رُک، صاف و پوست‌کندە

**baldachin** /ˈbaldəkɪn, US ˈbɔːld-/ *noun*, also baldaquin /ˈbɔːldəkɪn/
چەترە، ئاسمانە (بنەڕەت: لە *baldacchino* ئیتالیایی، لە *Baldacco* "بەغدا(د) Baghdadی ئێراق") ⟐ سایبان

**bald cypress** *noun*
1 سەوڵەڕووتەنە، سەرەوەڕووتاوە: جۆرێ سنەوبەری گەڵاوەریوی deciduous گەورە (لە خێزانی *Taxodium distichum*) Taxodiaceae)، هی زەلکاوەکانی باشووری ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا؛ هەروەها: دارێکی پێوەندیداری (*T. mucronatum*) مەکسیک و باشووری تێکزاس 2 داری سوور و سەختی سەوڵەڕووتەنە کە زۆر بۆ ناسکەتەختە shingle بەکاردێنرێ ⟐ نوعی سرو

**bald eagle** *noun*
هەڵۆی سەرسپی، هەڵۆی ئەمریکایی (وەک نیشانە و هێمای ئەمریکا بەکاردێنرێ. [*Haliaeetus leucocephalus*]) ⟐ عقاب گر

**Balder** *noun*, Old Norse *Baldr*
باڵدیر، باڵدر (نۆرسی کۆن): کوڕی Odin و Frigga و خوای رووناکی و ئاشتی نۆرس ⟐ بالدر

**balderdash** /ˈbɔːldədæʃ, US -dərd-/ *noun*
قسەی هیچەکە، قسەی بێ‌تام، هەڵیت‌وپڵیت ⟐ یاوە، چرند

**bald-faced** *adjective*
قسەلەڕوو، ئاشکرا، روون، بێ‌پەردە ⟐ رک، صاف و پوست‌کندە

**baldhead** = baldpate

**baldheaded** *adjective*
تاس، سەرتاس، سەربێ‌موو، سەرڕووتاو ⟐ تاس

**baldie** = baldy

**baldmoney** /ˈbɔːldmʌni/ = spignel

**baldpate** *noun*
مرۆی سەرتاس ⟐ آدم تاس

**baldric** /ˈbɔːldrɪk/ *noun*
(مێژوویی) شیربەست، شمشێربەند، شمشێرگیر، بەستی شمشێر، زێرواڵا، حەمایل (بنەڕەت: لە

*baudre* فەرەنسی کۆن) ◌ بند شمشیر، حمایل

**baldy** *noun, adjective,* also baldie

*n* (نافەرمی، سووکانە) مرۆی کەچەڵ یان سەرتاس *adj* (لە سکاتلەند و ئیرلەند) تاس، کەل ◌ *n* آدم تاس *adj* تاس

**bale**[1] /beɪl/ *noun*

گورزە، تا، تایە، بەستە، مۆچ، بەستەک، تۆپ، کۆما، لۆدە، کۆگا، کوا (*a bale of paper*، *a bale of hay*، *baler n*) ◌ بسته، عدل، کپه

**bale**[2] /beɪl/ *noun*

بەلا، رەنج، بەدبەختی، ئاپۆر، نەهامەتی، مەینەتی ◌ محنت، مصیبت

**baleen** /bə'li:n/ = whalebone

**baleen whale** *noun*

(گیانەوەرناسی) نەهەنگێ کە ئێسکی شەویلکەی هەیە [ژێردەستە Mysticeti] ◌ گروهی از وال‌ها

**bale fire** *noun*

ئاگری وریاکردنەوە، ئاوری هۆشیارکردنەوە ◌ آتش اخطار

**baleful** /'beɪlfl/ *adjective*

1 بەدفەر، نگریس، (بەد)شوم، بێ‌ودم 2 بەزیان، بەزەر، بەوەی، کوشندە، پڕمەترسی، هەرەشاوی، ترسناک (*a baleful look/influence*؛ balefully /'beɪlfəli/ *adv*: نگریسانە، بەدفەرانە، پڕمەترسی‌یانە؛ balefullness /'beɪlflnəs/ *n*) ◌ 1 شوم، منحوس 2 مضر، پرمخاطره

**balibuntal** /ˌbalɪ'bʌnt(ə)l/ *noun*

جۆرێ حەسیری پڕچنراو، بۆ کلاو بەکاردێتری (بنەرەت: لە *Baliuag* فیلیپین، شوێنێ ئەو حەسیرەی لێ سەرهەڵداوە + buntal) ◌ بالیبونتال

**Balinese** /ˌbɑ:lɪ'ni:z/ *noun, adjective, pl.* same

*n* 1 خەڵکی Bali 2 زمانی ئیندۆنیزیایی بالی *adj* سەربە بالی، خەڵکەکەی یان زمانەکەی ◌ بالی

**balistraria** *noun*

کون (لە قەلا و بۆ خستنی تیر) ◌ سوراخ

**balk** = baulk

**Balkan** /'bɔ:lkən/ *adjective, noun*

*adj* سەربە نیمچەدوورگە یان دانیشتووانی بالکان *n* (the Balkans) ولاتانی بالکان، ولاتانی نیمچەدوورگەی بالکان، یۆگۆسلاڤیا، رۆمانیا، بولگاریا، ئالبانیا، یۆنانی و بەشی ئەورووپایی تورکیا ◌ بالکان

**Balkanization** *noun*

دابەش‌کردن یان دابەشاندن بۆ پارچە و کەرتی ورد(تر) ◌ بالکانیزاسیون

**balky** /'bɔ:lki, US 'bɔ:ki/ *adjective* (balkier, balkiest), Brit. also baulky

1 نەگونجاو، نالەبار، نەشیاو 2 یارمەتی‌نەدەر، هاوکاری‌نەکردوو، لاجەڵەو: uncooperative (balkiness *n*) ◌ 1 نامناسب، ناشی 2 فاقد حس همکاری

**ball**[1] /bɔ:l/ *noun*

1 تۆپ، گۆگ، خڕۆکە، گۆ، گرمۆڵە، کولو (خوری و هتد) 2 گلۆلە، تۆپ، گنا 3 گوللە، ساچمە 4 گلۆر، گروفەر، گلۆر، خڕی ◌ 1 توپ، گوی، کره 2 کلاف 3 گلوله، ساچمه 4 گردی

**ball**[2] /bɔ:l/ *noun*

شایی، سەما (کۆڕ) ◌ رقص

**ballad** /'bæləd/ *noun*

بەیت، لاوژە، چیرۆکی هۆنراوە، چامە، بەستە، ستران، گۆرانی (دڵدارانە؛ balladeer *n*؛ balladic *adj*؛ balladry *n*) ◌ شَروه، ترانه

**ballade** /bæ'lɑ:d/ *noun*

بەلاد، سەربەند(ە)، پارچە موسیقایێکی دڵدارانە یان رۆمانتیک، ب.ت. بۆ پیانۆ ◌ ترجیع‌بند

**ballad metre** = common metre

**ball and chain** *noun*

گۆ و زنجیر(ە)، گۆزنجیرەیی ◌ گوی و زنجیر

**ball-and socket joint** *noun*

بەستەگۆیی، بەستی تۆپی، خڕبەند، گۆ و بەند، جومگەی گۆیی، جومگەگۆیی (میکانیک) ◌ مفصل کروی

**ballan wrasse** /'balən/ *noun*

بنبۆکە: پیرێژنەیێکی زلەی کەنار و شۆستە بەردانی‌یەکان [*Labrus bergylta*] (لە *ballán* ئیرلەندی، لە *ball* "spot") ◌ نوعی ماهی

**ballast** /'bæləst/ *noun*

1 پارسەنگ، راگیرە، سەنگ یان قورسەی هاوکێشی، هاوسەنگێنە 2 ورکەبەرد، زیخ (چینێکە بۆ دارشتنی بنکی ریگاوبان) ◌ 1 وزنەی تعادل 2 بالاست

**ball-bearing** *noun*

گۆبەند، بۆلبرینگ ◌ بلبرینگ

**bellboy** /'bɔ:lbɔɪ/ *noun*

کوری تۆپ‌هەڵگرەوە، تۆپ‌چن (لە تێنیس‌دا) ◌ بولبوی

**ball clay** *noun*

تۆپەڵەقوڕ، چوونە ◌ بال کلای

**ballcock** /'bɔ:lkɒk, US -kɑ:k/ *noun*

سەراوکەوتە، سەرکەوتە، پەستێنەی گۆیی ◌ شناور

**ballerina** /ˌbælə'ri:nə/ *noun*

ژنەسەماکەری بالی یان بالێی ◌ بالرین

**ballet** /'bæleɪ/ *noun*

سەما یان هەڵپەڕکێی بالی، بالی، بالە، بالە، تیپ یا کۆڕی بالی، موسیقای بالی (balletic *adj*؛ balletically *adv*) ◌ باله، گروه باله، موسیقی باله

**ballet-dancer** *noun*

سەماکەر یان دانسێری بالی یان بالی، سەماکێشی بالێت ◌ بالرین

**balletomane** /'balɪtəʊˌmeɪn/ *noun*

هۆگری بالی یان بالی، هۆگر بە بالێت ◌

علاقمند به باله

**balletomania** *noun*
هۆگریتی بە بالێ یان بالی، هۆگریتی بە بالێت ۞ علاقمندی به باله

**ballflower** *noun*
گیازەنگولە، گولەپیالە، گولەزەنگولە، گیایێکی گوڵزەنگولەیی سپی، ئەرخەوانی یان شین ۞ گل استکان

**ballflower moulding** *noun,* also ballflower ornament
نەخشی گیازەنگولەیی یان گولەزەنگولەیی ۞ ابزار گل استکانی

**ball game** *noun*
1 گۆیێن، تۆپێن، تۆپ‌تۆپێن 2 بێسبۆڵ (ئەمریکا) 3 رەوش، کاودان، هەل‌ومەرج، بار ۞ 1 بازی با توپ 2 بیس‌بال 3 موقعیت، وضع

**ballgirl** /ˈbɔːlgɜːl, US -gɜːrl/ *noun*
کچی تۆپ‌هەڵگرەوە (لە تێنیس‌دا) ۞ بال‌گرل

**ballista** /bəˈlɪstə/ *noun, pl.* ballistae /-stiː/ or ballistas
مەنجەنیق، هێلکال، هێلکان، بەرداوێژ (بنەرەت: لە لاتینەوە، لەسەر بنچینەی *ballein* یۆنانی‌یەوە "هاویشتن") ۞ منجنیق

**ballistic** /bəˈlɪstɪk/ *adjective*
1 هاوێژەیی، سەربە هاوێژەناسی، سەربە هاوێژەمەنی یان تەنێ کە بەپێی قانوونی هاوێژەناسی دەڕوا 2 (go ballistic) irrational یا overwrought بەردبەباکردن، بوون: *He went ballistic when I told him* ۞ (ballistically /bəˈlɪstɪk(əli)/ *adv*) پرتابی، پرتاب‌شناختی

**ballistic missile** *noun*
مووشەکی بالیستیکی ۞ موشک بالیستیکی

**ballistics** /bəˈlɪstɪks/ *noun, pl.*
هاوێژەناسی، زانستی هاوێژەمەنی، زانستی بزوانی شتە هاوێژراوەکان؛ تایبەتمەندی فڕینی هاوێژەکان (ballistician *n*) ۞ پرتاب‌شناسی

**ballocks** *noun,* also bollocks, *pl.*
1 فلتە، قسەی هیچەکە، شرم‌وبرم 2 گون، وەتە ۞ 1 چرند، یاوه 2 بیضه

**balloon** /bɔˈluːn/ *noun*
1 بالۆن، شاتۆپ، گاتۆپ 2 فوودانە، پزدان 3 شووشەیێکی گەورەی خڕ بۆ خواردنەوە، ب.ت. براندی 4 (نافەرمی، سکاتلەند) کەسێکی گەوج (بنەرەت: لە *ballon* فەرەنسی یان *ballone* ئیتالیایی "تۆپی گەورە "large ball") ۞ 1 بالون 2 بادکنک 3 بالون 4 آدم احمق

**balloon angioplasty** *noun*
نەشتەرگەری گەورە یان هەمراوکردنەوەی رەگی خوێن بە رێگای catheter بالۆنەوە ۞ بالون آنژیوگرافی

**balloonfish** *noun, pl.* same or balloonfishes
بالۆنەماسی، ماسی‌یەبالۆنە [ *Diodon holocanthus*] ۞ نوعی ماهی

**ballooning** *noun*
بالۆن‌سواری، شاتۆپ‌سواری، بالۆنەوانی ۞ بالون‌سواری

**balloonist** /bɔˈluːnɪst/ *noun*
بالۆن‌سوار، شاتۆپ‌سوار، بالۆنەوان ۞ بالون‌سوار

**balloon tyre** *noun*
تایەی پان (بای کەم تیایە) ۞ لاستیک اسپورت

**ballot** /ˈbælət/ *noun*
1 دەنگ 2 دەنگ‌پەڕ، پەڕەی دەنگ، پەڕەی دەنگ‌دان، دەنگ‌نامە 3 دەنگ‌دان 4 رێکخستەی دەنگ‌دانی نهێنی 5 مافی دەنگ‌دان 6 دەنگەکان، کۆی دەنگ: *She won 58.8% of the ballot* ۞ 1 رأی 2 ورقەی رأی‌گیری 3 رأی‌گیری 4 سیستم رأی‌گیری مخفی 5 حق رأی 6 آرا

**ballot-box** *noun*
سنووقی دەنگ ۞ صندوق رأی

**the ballot-box** *noun*
رێکخستە یان سیستمی دەنگ‌دان لە هەڵبژاردنێک‌دا: *The people make their wishes known through ballot-box* ۞ سیستم رأی‌گیری در یک انتخابات

**ballot paper** *noun*
دەنگ‌نامە، پەڕ یان کاغزی دەنگ‌دان ۞ ورقەی رأی‌گیری

**ballot-rigging** *noun*
فرت‌وفێڵ یان گزەکاری لە هەڵبژاردن‌دا ۞ تقلب در انتخابات

**ballpark** /ˈbɔːlpɑːk, US -pɑːrk/ *noun*
1 یاریگەی تۆپێن، یاریگای بەیسبۆڵ، بەیسبۆڵگە 2 (نافەرمی) پانتایی، مەڵبەند، بوار ۞ 1 بولپارک، زمین بیس‌بال 2 حوزه

**ball-pen** *noun*
خودکار ۞ خودکار

**ballpoint** /ˈbɔːlpɔɪnt/ *noun,* also ballpoint pen
خودکار ۞ خودکار

**ballroom** /ˈbɔːlruːm, US -rʊm/ *noun*
سەماخانە، خانەی هەڵپەڕکێ، هۆڵی هەڵپەڕکێ یان سەما ۞ تالار رقص

**ballroom dancing** *noun*
جۆرێکی هەڵپەڕکێ (سەما) بە ریتمە نەریتی‌یەکان یان ب.ت. waltz ۞ موسیقای وۆلس بالروم دانسینگ

**balls** /bɔːlz/ *noun, interjection, pl.*
*n* 1 گون، وەتە 2 هەڵیت‌وپلیت 3 گەندەڵکاری، گووکاری، تیریان *interj* قسەی قۆڕ ۞ *n* 1 خایه 2 چرت‌وپرت 3 افتضاح *interj* مزخرف

**balls-up** *noun*

گووکاری، تیریان، تیکدان، شیواندن ۞ افتضاح، گەکاری

**ballsy** *adjective* (ballsier, ballsiest)
نەترس، بویر، چاوسوور، بێباک، دلنیا ۞ متهور، دلیر، مطمئن

**ball valve** *noun*
زمانەی گۆیی، تۆپەوانە (میکانیک) ۞ دریچەی کروی

**ballyhoo** /ˌbæliˈhuː, US ˈbælihuː/ *noun*
(نافەرمی) زەنازەنا، قالمەقالم، هەراوزەنا، بگرەوبەردە، هەاروهوریا، ژاوە ۞ هیاهو، جنجالی

**balm** /bɑːm/ *noun*
1 رۆنی بەلسان یان بام 2 گیاسەودا (هەروەها common balm، توخم *Commiphora*؛ گەلێ جۆرن)؛ بۆ ناوی کۆمەلە گیا یان رووەکێکی بۆنخۆشی تر بەکاردێنرێ، زۆرتر خێزانی mint. ب.ن. lemon balm 3 مەرهەم، هەتوان 4 هێدیکەرەوە، خەمڕەوێن، ئارامکەرەوە، هێورکەرەوە ۞ 1 بَلسان 2 وارنگبو 3 مرهم 4 آرامبخش

**balm of Gilead** /ˈgɪlɪæd/ *noun*
1 بەلسانی جیلیاد، جەوک یان ریزینی جیلیاد (لە هێندێ دار دەگیرێ) 2 درەختێ کە ئەو جەوکە بەرهەم دێنێ [ *Commiphora gileadensis* (عەرەبستان) و جۆرەکانی تر] ۞ بلسان جیلیاد

**balm of Mecca** *noun*
بەلسانی مەکی یان مەککەیی ۞ بلسان مکی

**balmily** /ˈbɑːmili/ *adverb*
خۆش، بەشێوەیەکی خۆش ۞ به طور مطبوع

**balminess** /ˈbɑːminəs/ *noun*
خۆشی، بۆنخۆشی، بەبەرامی ۞ مطبوعیت، معطر بودن

**balmoral** /balˈmɒr(ə)l/ *noun*
1 جۆرێ کلاوی بێلیواری خڕ، لە لایەن هێندێ هەنگی regiment سکاتلەندییەوە لەسەر دەکرێ 2 جۆرێ چەکمە یان پۆتینی چەرمی قەیتانداری قورس ۞ بالمورال

**bal musette** /ˌbal mjuːˈzɛt, French bal myzɛt/ *noun, pl.* same
تالاری سەما کە تیپی ئاکۆردیۆنی لێیە ۞ بال موزت

**balmy** /ˈbɑːmi/ *adjective* (balmier, balmiest)
1 گەرموخۆش، خۆش (هەوا): *a balmy summer evening* 2 بۆنخۆش، بەبۆن و بەرام 3 مەلهەمی، مەرهەمی ۞ 1 ملایم، مطبوع 2 معطر 3 مرهمی

**balneological** *adjective*
سەربە گەرماوناسی ۞ وابسته به بالنیولوژی

**balneologist** *noun*
گەرماوناس ۞ بالنیولوژیست

**balneology** /ˌbalnɪˈɒlədʒi/ *noun*
1 گەرماوناسی، لێکۆلینەوەی کانیاوە دەرمانییەکان و لایەنی چارەسەری و خۆتیاشۆردنیان 2 وشەیێکی تر بۆ balneotherapy (بنەرەت: لە لاتین *balneum* "گەرماو" + -logy) ۞ بالنیولوژی

**baloneotherapy** /ˌbalnɪə(ʊ)ˈθɛrəpi/ *noun*
تیمار یان چارەسەری نەخۆشی بەهۆی خۆشتن لە کانیاوە سروشتییەکان(دا) ۞ بالنیوتراپی

**baloney** /bəˈləʊni, US -ˈloʊ-/ *noun*, also boloney
1 هەلیتوپلیت، حەلەقومەلەق 2 = bologna ۞ چرتوپرت

**balsa** /ˈbɔːlsə/ *noun*
1 (سپانیایی، هەروەها balsa wood) داری بەلسا (تەختە یان دارێکی زۆر سووک) 2 درەختێکی زووهەلدەری گەرمێنانی ئەمریکا [ *Ochroma lagopus*] ۞ 1 چوب بالسا 2 درخت بالسا

**balsam** /ˈbɔːlsəm/ *noun*
1 ئەنزەرووت، داری بەلەسان [توخم *Impatiens*] 2 رۆنی بەلەسان، رۆنی ئەنزەرووت ۞ 1 درخت بلسان 2 روغن بلسان

**balsam fir** *noun*
سنەوبەری ئەنزەرووت یان بەلەسان: جۆری داری سنەوبەری ئەمریکای باکووری کە Canada balsam دێنێ [*Abies balsamea*] ۞ صنوبر بلسان

**balsamic** /bɔːlˌsæmɪk/ *adjective*
ئارامکەرەوە، دامرکێن، هێورکەرەوە، خەمڕەوێن ۞ آرامبخش

**bals musettes** = plural form of bal musette

**Balt** /bɔːlt, US bɒlt/ *noun*
1 ئاخێوەر بە زمانی بالتیک 2 خەلکی یەکێ لە ولاتانی بالتیکی لیتوانیا Lithuania، لاتڤیا Latvia و ئێستۆنیا Estonia ۞ بالت

**Balthazar** /balˈθazə/ *noun*
شووشەمەیێکی یەکجار زل، بە ئەندازەی 16 شووشەی ئاسایی (لە ناوی پاتشایی بابل *Balthazar* (Dan: 5:1) ۞ بالتازار

**Balti** /ˈbaltɪ/ *noun, adjective*
*n* 1 بالتیستانی، خەلکی Baltistan، ناوچەیێ لە هیمالایا 2 زمانی تەبەتی ئەو گەلە *adj* سەربە بالتیستانییەکان یان زمانەکەیان ۞ بالتیستانی

**Baltic** /ˈbɔːltɪk, US ˈbɒlt-/ *noun, adjective*
*n* لقی زمانانی هیند و ئەورووپایی کە بریتییە لە لیتوانی(یایی) Lithuanian، لاتڤیایی Latvian و پروسیا Prussianی کۆن *adj* سەربە دەستەی زمانی بالتیک ۞ *n* بالتیک *adj* وابسته به گروه زبانهای بالتیکی

**the Baltic states** *noun, pl.*

ولاتـانی بالـتیک (بـریتین لـه لاتـفیا، لیتوانیـا و نیـستونیا) ◌ کشورهای بالتیک

**Baluchi** /bə'luːtʃi/ *noun, adjective*

*n* 1 خەڵـکی بەلوچـستان لـە ڕۆژاوای ئاسـیا 2 زمـانی ئێـرانی بـەلوچی *adj* سـەربەو گەلـە یـان زمانەکەیان ◌ بلوچی

**balun** /'balʌn/ *noun*

جـۆرێ ترانـسفۆرماتۆری ئێلیکتریکـی، بـۆ بەسـتنەوەی خولگـەی ناهاوسـەنگ و خولگـەی هاوسەنگ بەکاردێترێ (بنەڕەت: لە *bal(ance to) un(balance transformer)* پێکهـاتووە) ◌ بالان

**baluster** /'bæləstə(r)/ *noun*

سـتوونۆکە، سـتوونۆکەی نـەردە، سـتوونی نـەردە ◌ میلەی نرده، صراحی

**balustrade** /ˌbælə'streɪd/ *noun*

نەردە، چاغ، سیاج، شوورە ◌ تارمی، نرده

**balustraded** *adjective*

نەردەڕێز، شوورەدار، نەردەکراو ◌ تارمی‌دار

**Bambara** /bam'bɑːrə/ *noun, pl.* same or Bambaras

1 خەڵکی ڕۆژاوای ئەفریکای کە زۆرتر لە مالی Mali دەژین 2 زمـانی Mande ئـەو خەڵـکە ◌ بامبارا

**bambino** /bam'biːnəʊ/ *noun, pl.* bambini /-ni/ or bambinos

1 منـاڵ، منـداڵ، زارۆک 2 وێنـەی مـەسیح یـا کریـست لـە سـاوایی‌دا (بنـەڕەت: ئیتالیـایی، چکـۆلێنراوی *bamboo* "منـداڵ" child) ◌ 1 کودک 2 تصویر مسیح در قنداق

**bamboo** /ˌbæm'buː/ *noun (pl.* bamboos*), adjective*

*n* 1 بـامبو، لەلـە، لـەوان (ی هینـدی)، لـەقـەن، تـەرکـەز، نـەیـزە، ئـارچ، قامیـشی هینـدی [*Bambusa* و توخمەکانی تر] *adj* خەیزەرانی، قامیـشی (لەسـەرب بنچینـەی *mambu* مالزیـایی) ◌ *n* 1 خیزران *adj* خیزرانی

**bamboo curtain** *noun*

پەردەی قامیشی (ئاماژە بەو دیوارە ڕامیاری‌یەی (یان بـەربەسـتێکی ئایدیۆلۆژیکی، لەشکری و سیاسـی) کە لـە ساڵـەکانی 1949ـ72 کۆمـاری گـەلی چـین دابـڕیبوو، لـە بەرامبـەر پـەردەی ئاسنین‌دا) ◌ پردەی خیزرانی

**bamboo rat** *noun*

مـشکی بـامبوو، هـی دارسـتانەکانی باشـووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا [توخم *Rhyzomys*: چـەندین جۆرن] ◌ موش خیزران

**ban**[1] /bæn/ *noun*

1 بەربەنـدێتی، نـەلێکردن، ڕێگـرتن، نەهێـشتن، قەدەخە، بەربەنداندن، قەدەخاندن، قەدەخەکردن، تـەکفیر 2 ڕتـان، لەعنـەت ◌ 1 ممنوعیـت، نهـی، منع، بازداری، تحریم، تکفیر 2 نفرین

**ban**[2] /bɑːn/ *noun, pl.* bani /'bɑːni/

بان: یەکەی پارەی ڕۆمانیا، بەرامبەر بە سەدیەکی لیو Lue ◌ بان

**banal** /bə'nɑːl/ *adjective*

ئاسـایی، ڕەمـەکی، سـەرپێیی، ناسـەرنجڕاکێش، هیچەکـە، ناگرنـگ، ئایـەخ، trite ) banally /bə'nɑːli/ *adv*) ◌ معمولی، پیش‌پاافتاده

**banality** /bə'næləti/ *noun, pl.* banalities

ئایـەخ بـوون، هیچەکـەیی بـوون، هیچـی، ناسەرنجڕاکێشی، شێرزەیی: *the banality of modern city life* ◌ پیش‌پاافتادگی، ابتذال

**banana** /bə'nɑːnə, US bə'nænə/ *noun*

1 هەنجیرباوا، مۆز 2 (هەروەها banana plant یـان banana tree) داری مـۆز [تـوخم *Musa*: چەندین جۆرن] ◌ 1 موز 2 درخت موز

**banana belt** *noun*

(تافـەرمی، ئـەمریکا) پـشتێنەی مـۆزی (= ناوچـەیێکی تـا ئەنـدازەیێ بـە تـاو و هـەوای گەرمەوە) ◌ کمربند موزی

**banana oil** = amyl acetate

**bananaquit** /bə'nɑːnəkwɪt/ *noun*

جۆرێ باڵندەی دەنگ‌خۆشی دەنووک‌چەماو، هی کاریبیەن و ئەمریکای ناوەندی و باشووری [*Coereba flaveola*] ◌ نوعی پرنده

**banana republic** *noun*

(تایەسند و سووکانە) وڵات یان کۆماری مۆزی (وڵاتێ کـە لـەباری ڕامیـاری‌یـەوە نـاجێگیر و لەباری ئابووری‌شدا تاک‌بەرهەم یان بەند بێ بە پارەی بیانی‌یەوە) ◌ کشور پیزی

**bananas** *noun*

شێت، گەوج، کەر ◌ احمق، دیوانه

**banana skin** *noun*

هەڵـەی دیـار، لێ‌هەڵقلیشان، شاشـی، هەڵـەی بەرچاو: *Putting even more tax on fuel could prove to be a banana skin for the government* ◌ گاف

**banana split** *noun*

سپلیتی مۆز، دێسێری بەستەنی مۆز ◌ سپلیت موز

**banausic** /bə'nɔːsɪk/ *adjective*

1 سـەربە کـاری تکنیکـی 2 = mundane ◌ وابسته به شغل فنی

**band**[1] /bænd/ *noun*

باریکە، بەنۆکە، سیرمە، تیزماڵک، قایش، تەوق، بەند، بەست، شریت، تەسمە، پێ‌بەست (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ نوار، بند، تسمه

**band**[2] /bænd/ *noun*

1 کۆمـەڵ، دەسـتە، کـۆڕ، تیـپ، تـاقم، سـازبەند، دەستەیێکی چکۆلەی موسیقاژەنان کە موسیقای پـاپ، جـاز و ڕاک کـار دەکـەن، دەسـتـەی موسیقاژەنانی ئامێرە بـایی (یـان فـوویی)، زەرد و

پیاکێشانەکـان 2 بـوار یـان مـەودای شـەپۆلە رادیۆیی‌یەکان، باندی شەپۆل 3 (ئەمریکا) رەوە، گەل، مێگەل، کەرک ۞ 1 دستە، گروه، باند، گروه نوازندگان 2 باند موج 3 گله، رمه

**bandage** /'bændɪdʒ/ *noun*
برینپێچ، سارغی، پێچەک، تیوەپێچ ۞ باند

**bandaged** *adjective*
بـرین‌پـێچ‌کـراو، پێچـەک‌بەنـد، تیـوەپێچراو، سارغی‌تێئالاو، سارغی‌پێچ(کراو) ۞ باندپیچی‌شده

**Band-Aid** = plaster

**bandanna** /bæn'dænə/ *noun*, also bandana
دەسرەی مل، ملپێچ ۞ دستمال گردن

**B and B** = bed and breakfast

**bandbox** /'bændbɒks/ *noun*
1 جێ‌کڵاو، سنووقی مقەبایی، کارتۆن، قوتـوی مقەبایی 2 نەوی‌نەو، دەست‌لێنەدراو ۞ 1 جعبەی مقوایی 2 تر و تمیز

**band council** *noun*
شێوەیێکی خۆجێیی فەرمانڕەوانی رەسـەنەکانی ئەوسـترالیا لـە کـەنەدا، پێکهـاتوو لـە ئەندامانی ئەنجومەن و سەرۆکێکی هەڵبژاردە ۞ باند کونسیل

**bandeau** /'bændəʊ, US -doʊ/ *noun, pl.* bandeaux /-dəʊz/
1 بەندو، پرچ‌بەست، سەربەند، قژبەست، قژبێن 2 جۆرێ سینەبەندی ژنان: *a bandeau bikini* ۞ 1 هدبند 2 بندو *top*

**banderilla** /ˌbandə'ri:jə, US -rɪljə/ *noun*
ئاڵا (دەکرێتە مل یان سەرشانی گای شەڕ) ۞ باندریلا

**banderillero** /ˌbandərɪl'jɛːrəʊ, US -ri:'jɛːrəʊ/ *noun, pl.* -nderilleros
گاسوارێ کە ئەو ئاڵایە بەکاردێنێ ۞ باندریلرو

**banderole** /'bandərəʊl/ *noun*, also banderol
ئاڵای باریک و درێژ ۞ پرچم باریک و دراز

**bandfish** *noun, pl.* same or bandfishes
1 جـۆرێ ماسـی درێـژی دەریـایی [ *Cepola rubescens* و جۆرەکانی تر] 2 جۆرێ ماسی زلەی خۆراکی ئاوی شرینی ئەمریکای باشووری [*Rhamphichthys rostratus*] ۞ باندفیش

**bandicoot** /'bandɪku:t/ *noun*
بەرازمـــشک، مـــشکەبەراز (= جـــۆرێ توورەکەداری مێرووخۆر) رەسەنی ئەوسترالیا و گینەی نوێ [خێزان Peramelidae: چەندین جۆرن] (بنەڕەت: لە *pandikokku* ی Telugu ـەوە "pig-rat") ۞ بانديكوت

**bandicoot rat** /'bandɪku:t/ *noun*
مـشکی بانـدیکوت (ئاسیایی، لـە زۆر شـوێندا مێملێکی ماڵوێرانکەرە [*Bandicota indica* و جۆرەکانی تر]) ۞ موش بانديكوت

**bandit** /'bændɪt/ *noun, pl.* bandits or banditti /ban'di:ti/
1 رێگر، رێبر، چەتە، کەلەشە، دزی چەکدار 2 (بـە زمـانی لەشـکری) فڕۆکـەی دوژمـن ۞ 1 راهزن، دزد مسلح 2 هواپیمای دشمن

**banditry** /'bændɪtri/ *noun*
رێگری، چەتەیی، جەردەیی، دزیتی چەکدارانە ۞ راهزنی، دزدی مسلحانه

**bandleader** *noun*
یەکـەم موسـیقاژەنی سـازبەندێ ۞ نوازنـدەی نخست ارکستری

**bandmaster** /'bændmɑ:stə(r), US -mæs-/ *noun*
سـەرتیپی موسـیقا، رێبـەری کـۆری موسـیقا، سەرسازبەند، سەرئۆرکێستێر ۞ رهبر دستەی موزیک

**bandog** /'bændɔ:g/ *noun*
جۆرێ سەگی شەڕانی دڕ و بەقەوەت، سەگی زنجیری ۞ نوعی سگ

**bandolier** /ˌbændə'lɪə(r), US -'lɪr/ *noun*, also bandoleer
فیشەکبەند، رەختەفیشەک، فیشەکدان، خەریتە ۞ قطار فشنگ

**bandoline** /'bændəlɪn/ *noun*
رۆنی مێو ۞ روغن موم

**bandoneon** /ban'dəʊnɪən/ *noun*
جـۆرێ concertina ی چوارگـۆش، بـاو لـە ئـارژانتین (بنـەڕەت: بـە رێگـای سـپانیایی لـە *Bandonion* ئەڵمانی، لە ناوی هاینریش باند Heinrich *Band* موزیسیەنی ئەڵمانی کە ئەمەی داهێنا) ۞ باندونیون

**bandore** /ban'dɔ:/ *noun*, also bandora /ban'dɔ:rə/
بەندۆر (= ئامێرێکی موسیقایی کە شێوەی گیتار دەدا) ۞ بندور

**band-saw** /'bændsɔ:/ *noun*
باریکەمـــشار، مـــشاری شـــریتی، توولەمـــشار، توولەهەرە ۞ ارەی نواری

**bandshell** *noun*
جێگـای دەسـتەی موسـیقا کـە بـە شـێوەی لەپکەیێکی رووچاڵی گەورە و بە تایبەتمەندی دەنگی تایبەتەوە ۞ باندشل

**bandsman** /'bændzmən/ *noun, pl.* bandsmen /-mən/
ئەندامی کۆڕ یان دەستەی موزیک ۞ عضو دستەی موزیک

**bandstand** /'bændstænd/ *noun*
سەکۆ یان جێگەی دەستەی موزیک ۞ جایگاه دستەی موزیک

**bandura** /ban'du:rə/ *noun*
جۆرێ ئامێری ژێداری ئۆکراینی ۞ باندورا

**bandwagon** /'bændwægən/ *noun*, jump on the bandwagon

1 (مێژوویی) واگۆنی موسیقایی یان هەڵگری تیپی موسیقا 2 لە مووێنک هوویێک کردنەوە، لە کاروان دوانەکەوتن، دەرفەت قۆستنەوە ◌ 1 واگون موسیقی 2 همرنگ جماعت شدن، بە هر سازی رقصیدن

**band-wheel** /ˈbændwiːl/ *noun*
پێچکەی تەسمەخۆر، چەرخی تەسمەیی ◌ چرخ تسمه‌خور

**bandy**[1] /ˈbændi/ *adjective* (**bandier, bandiest**)
لاقچەویل، پێچەویل، لاق یان پێی کەوانەیی ◌ پاچنبری

**bandy**[2] *noun*
جۆرێ یاری شێوە هاکی (پێدەچێ bandy[1] لەمەوە بێ) ◌ باندی

**bandy-bandy** *noun, pl.* bandy-bandys
ماری چکۆلەی ژاراوای ئەوسترالیایی، بەندی سپی و رەشی پیاهاتووە [*Vermicella annulata*] (بنەرەت: لە *bandi bandi* Kattah) ◌ نوعی مار

**bandy-legged** *adjective*
لاقچەویل، پێچەویل، لاق یان پێی کەوانەیی ◌ پاچنبری

**bane** /beɪn/ *noun*
1 تێکڕووخێن، بەڵای گیان، (ماڵ)وێرانکەر، مایەی تیاچوون، هەراسانکەر، بەڵا، مردن، لەنێوچوون 2 (لە لێکدانا) ژار، دەرمان ◌ 1 مایەی نابودی، مرگ، مرگبار، هلاکت 2 (در ترکیب) سم

**baneberry** *noun, pl.* baneberries
1 جۆرێ رووەکی گوڵکوڵکن [*Actaea spicata* (herb Christopher) و جۆرەکانی تر] 2 بەری تاڵ و زۆرتر ژاراوی ئەم رووەکە ◌ 1 نوعی گیاه 2 ثمرەی این گیاه

**baneful** /ˈbeɪnfl/ *adjective*
1 خراپ، شەرزە، تێکدەر، رووخێنەر 2 ژاراوی 3 مرێنەر، کوژندە، بەزیان، خراپ، بەزەر ◌ 1 مخرب 2 سمی 3 مهلک، مضر

**banefully** /ˈbeɪnfli/ *adverb*
تێکدەرانە، (بە شێوەیەکی) خراپ ◌ بە طور مخرب

**bang**[1] /bæŋ/ *noun, adverb, interjection*
*n* 1 (دەنگ) تەق، تەقتەق، شەق، زرمە، بەنگ، دەنگ، دەنگی تەقینەوە، بەمب 2 بزووتنەوەی کتوپڕ 3 لێدان 4 (شێوازێکی قژ) بەرچەم 5 (کامپیوتێر) نیشانەی (!) *adv* بەتەواوەتی، ورد، بەوردی، دروست *interj* کیوکیو (دەنگی تەقینی گوللە) ◌ *n* 1 بنگ، بامب 2 حرکت ناگهانی 3 ضربه 4 چتر زلف 5 بانگ *adv* کاملاً، دقیقاً *interj* بنگ‌بنگ

**bang**[2] /baŋ/ = bhang

**banger** /ˈbæŋə(r)/ *noun*
1 (تافەرمی) سوسیس: *bangers and mash* 2 (تافەرمی) شرەماشێن، داشقەشکاو، تۆقتۆقە 3 (تافەرمی) شرەماشێن، کەلاکەکەر، چەپەرەشڕ ◌ 1 سوسیس 2 ترقه 3 ابوقراضه

**bangkok** *noun*
(تایلەندی) جۆرێ کڵاوی ڕیشاڵی دارخورمای فیلیپینی ◌ بانگکوک

**Bangla** /ˈbʌŋlɑː/ *noun*
زمانی بەنگالی ◌ زبان بنگالی

**Bangladeshi** /ˌbaŋgləˈdɛʃi/ *noun, adjective, pl.* same or Bangladeshis
*n* خەڵکی بەنگلادیش، بەنگلادیشی *adj* سەربە بەنگلادیش یان خەڵکەکەی ◌ بنگلادشی

**bangle** /ˈbæŋgl/ *noun*
بازن(ـە)، خرخرە، پاوانە، خرخاڵ، پێموورزە، پامووره ◌ النگو، خلخال

**bang on** *adjective*
دروستی دروست، بە وەختی خۆی، جێی خۆی ◌ درست درست

**bangtail** *noun*
کلکبەرچەمی (هی ئەسپ) ◌ بانگتایل

**bang-up** *adjective*
(تافەرمی، ئەمریکا) زۆرباش، عال ◌ عالی

**bani** = plural form of ban2

**banian** /ˈbænɪən/ *noun*, also banyan
1 (هەروەها banian tree) هەنجیری هیندی 2 چاکەتی فلانێلی هەراوی هیندییەکان ◌ 1 انجیر هندی 2 بانیان

**banishment** /ˈbænɪʃmənt/ *noun*
دوورخستنەوە، شاربەدەرکردن، تاراندن ◌ تبعید

**banister** /ˈbænɪstə(r)/ *noun*, also bannister
1 نەردە، لاجامە، چاغ، ستوونۆکەی نەردە 2 دەسگیرە یان دەسکی پلیکان ◌ 1 نارمی 2 دستگیرەی پلکان

**banjo** /ˈbændʒəʊ, US ˈbændʒoʊ/ *noun, pl.* banjos or banjoes
بانجۆ (جۆرێ ئامێری ژێیە) ◌ بانجو

**banjoist** *noun*
بانجۆژەن ◌ بانجونواز

**bank**[1] /bæŋk/ *noun*
1 کەنار، کەناراو، موزورگ، پەراف، لێواری رووبار، بەستێن، رۆخ 2 تەپۆڵکە، زورگ 3 لێوار، زێوار، قەراخ، پەراوێز، (زەویزار) بەستە، سەرحەد، کەوشەن 4 کەڵەکە، کۆما، تۆپەڵە، بارستە 5 لێژ، لاپێیی (ڕێگا) 6 بەلاداخواربوونەوەی فرۆکە لە کاتی لادانا ◌ 1 ساحل 2 پشتە 3 حاشیه، مرز 4 توده 5 شیب (جاده) 6 بانک

**bank**[2] /bæŋk/ *noun*
بانک ◌ بانک

**bankability** /-əˈbɪlɪti/ *noun*

پەسندکراویی بانک، بانک‌پەسندی ۞ مورد قبولی بانک

**bankable** /ˈbæŋkəbl/ *adjective*

پەسندکراوی بانک، بانک وەری‌دەگری، بانک‌پەسند ۞ مورد قبول بانک

**bank account** *noun*

هەژمار یان ئێکەوتنی بانکی ۞ حساب بانکی

**bank balance** *noun*

پاشماوەی هەژماری بانکی ۞ موجودی بانکی

**bank-bill** *noun*, also banker's bill

1 حەوالەی بانکی 2 = banknote ۞ حوالەی بانکی

**bank-book** *noun*

دەفتەری هەژماری بانکی ۞ دفترچەی حساب بانکی

**bank card** *noun*, also cheque card or banker's card

کارتی چەک، چەک‌کارت ۞ چک‌کارت

**bank draft** *noun*

حەوالە یان درافتی بانکی ۞ حوالەی بانکی

**banker** /ˈbæŋkə(r)/ *noun*

(چ بانک چ قومار) خاوەن‌بانک، بانکەوان، چاودێری بانک (قومار): *a merchant banker* ۞ بانکدار

**banker's order** *noun*

فەرمانی پێدانی بەردەوام ۞ دستور پرداخت دائمی

**bank failure** *noun*

نابووتیی بانکی، نابووت‌بوونی بانکی ۞ ورشکستگی بانکی

**bank guarantee** *noun*

دەستەبەریی بانک ۞ ضمانت بانکی

**bank holiday** *noun*

پشوو یان وچانی فەرمی ۞ تعطیل رسمی

**banking**[1] /ˈbæŋkɪŋ/ *noun*

بانکداری، بانکەوانی ۞ بانکداری

**banking**[2] /ˈbæŋkɪŋ/ *noun*

دیوارە یان کەنار یان رۆخی دەسکرد ۞ خاکریز یا ساحل مصنوعی

**banking house** *noun*

دامەزرە یان دەزگا یان کۆمپانی بانکی ۞ مؤسسە یا شرکت بانکی

**bank interest** *noun*

سوودی بانکی ۞ بهرەی بانکی

**bank loan** *noun*

قەرز یان وامی بانکی ۞ وام بانکی

**bank manager** *noun*

سەرۆک یان بەڕێوەبەری بانک ۞ رئیس بانک

**banknote** /ˈbæŋknəʊt, US -noʊt/ *noun*

پارە، پارەی کاغزی ۞ اسکناس

**bank rate** *noun*

ڕێژەی سوودی بانکی ۞ نرخ بهرەی بانکی

**bank-robber** *noun*

بانک‌لێدەر، دزی بانک، بانک‌بڕ، بانک‌دز ۞ سارق بانک

**bankroll** /ˈbæŋkrəʊl, US -roʊl/ *noun*

1 نەختینە 2 پشتیوانەی دارایی یان پارەیی ۞ 1 نقدینە 2 منابع مالی

**bankrupt** /ˈbæŋkrʌpt/ *noun, adjective*

*n* نابووت(بوو)، مایەبۆش، مایەپووچ، سوخت، لەدارایی‌کەوتوو *adj* بێ‌بەری لە ۞ *n* ورشکستە *adj* فاقد

**bankruptcy** /ˈbæŋkrʌptsi/ *noun, pl.* bankruptcies

مایەبۆشی، نابووتی، لاتی، سەرنەکەوتوویی، تێشکان ۞ ورشکستگی، ناکامی

**banksia** /ˈbaŋksɪə/ *noun*

(ڕووەکناسی) دەوەنێکی هەمیشەسەوزی ئەوسترالیایی، گوڵەکانی شێوەی bottlebrush دەدەن [تۆخم *Banksia*] (لە ناوی ڕووەکناسی ئینگلیسی *Sir Joseph Banks*) ۞ بانکسیا

**banksias rose** *noun*

گوڵەباخی هەڵچووی گوڵوردی چینی: دەوەنێکی هەمیشەسەوزی ئەوسترالیایی، شێوەی bottlebrush دەدا [*Rosa banksiae*] ۞ نوعی رز

**bank statement** *noun*

لیستەی هەژمار یان حیسابی بانکی ۞ صورت حساب بانکی

**banned** *adjective*

1 بەربەند، قەدەغە(کراو)، یاساخ 2 داخراو، بەربەست‌کراو، بەسراو، ڕاوەستێنراو، ڕاگیراو ۞ 1 ممنوع 2 توقیف‌شدە

**banner** /ˈbænə(r)/ *noun, adjective*

*n* 1 پلاکارد، تالا، بەیداخ، دروشم 2 ناو، ناونیشان *adj* یەکجار باش، عال ۞ *n* 1 پلاکارد، پرچم، علم 2 اسم، عنوان *adj* عالی

**banneret** /ˈbanərɪt/ *noun*, also bannerette

1 ئالای چکۆلە 2 (مێژوویی) شۆرەسوارێ کە سەربازەکانی لەژێر ئالاکەیا لە شەڕدا فەرماندەری دەکرد ۞ 1 پرچم کوچک 2 بانرت

**banner headline** *noun*

سەردێڕ (ڕۆژنامە) ۞ تیتر، عنوان سرمقالە

**banner year** *noun*

ساڵی سەرکەوتن ۞ سال پیروزی

**bannister** = banister

**bannerol** = banneret (te)

**banning** *noun*

1 بەربەندی، بەرگرتن، نەهێشتن 2 داخستن، ڕاگرتن، بەستن (ڕۆژنامە و هتد) ۞ 1 منع، جلوگیری 2 توقیف

**banns** /bænz/ *noun, pl.*

بێبوبـــاب، داری باوبـــاب (دارێکـــی کـــورتی ئـــەفریکایی یـــان ئـــەوســـترالیایی [تـــوخم *Adansonia*: چەندین جۆرن]) ◌ بائوباب

**bap** /bæp/ *noun*

باپ (جۆرێ نانی خڕ و ئاڵقەیی و چکۆلانەیە) ◌ باپ

**baptisia** *noun*

بـەپتیزیا: رووەکێکـی ئـەمریکای بـاکووری لـە تـیرەی legume ـەکـان، گوڵـەکـانی گـەش و papilionaceous یـین [تـوخم *Baptisia*] ◌ باپتیسیا

**baptism** /'bæptɪzəm/ *noun*

1 ئاهەنگ یـان ڕێوڕەسمی تەوفن 2 یەکەمین ئەزموون ◌ 1 مراسـم غسـل تعمیـد 2 نخسـتین تجربه

**baptismal** /bæp'tɪzməl/ *adjective*

تەوفنی، سەربە تەوفن، تەعمیدی: *a baptismal service/ceremony* (baptismally /bæp'tɪzməli/ *adv*) ◌ تعمیدی

**baptismal name** *noun*

ناوی تەوفنی یا تەعمیدی ◌ اسم تعمیدی

**baptism of fire** *noun*

تاقیکردنـەوەی سـەخت یـان دژوار، ئـەزموونی سەخت ◌ امتحان دشوار

**baptist** /'bæptɪst/ *noun*

1 تەوفنکار، تەوفنگەر، تەوفنچی، مۆعەممید، باپتیسـت 2 (Baptist) ئەندامی تیرەی کریستانی پرۆتیستانت ◌ 1 تعمیددهنده 2 باپتیست

**baptistery** /'bæptɪstrɪ, US -tətrɪ/ *noun*, also baptistry, *pl.* baptisteries

تەوفنگا، جێگای تەوفنکردن ◌ محل غسل تعمید

**bar**[1] /bɑː(r)/ *noun, preposition*

*n* 1 میلـە، میـل، پـشکۆڵ، شیـشە، ئەسـتوون 2 پارچە، تیکە 3 گۆڵە، ئەردە، شمشێرە، تووڵک 4 قالـب (سـابوون) 5 قوڵـت، کەسـتەک، قورسـە، دارشـتە (زێـڕ) 6 باریکـە، شـریت، باریکـایی 7 تیشک، تیریژ، لیزگ، پرشنگ 8 هێڵ 9 ئێلیمێنت (کارەبـا) 10 ڕێگـرتن، نەهێـشتن، بەربەنـدی، بەربەست، لەمپەر، کۆسپ، کێشە 11 (موسیقا) خانە، مەودای موسیقا 12 مەیخانە 13 دەکە، بوتکـە 14 کافـە 15 جێگـای تاوانبـار، شـوێنی تایبەتی زیندانی لە دادگادا، دادگا 16 (جوگرافیا) بەستاو 17 یەکەی پەستان *prep* بێجگەلە، جگە، ژبلی، مەگەر ئەوەی کـە ◌ *n* 1 میل، میله، قطعـه 2 نرده 3 قالب 4 شمش 5 نـوار 6 پرتـو 7 خـط 8 المنت 9 منع، بازداری، مانع، رادع، مشکل 10 خـط میـزان (موسـیقی) 11 بـار 12 دکـه 13 کافـه 14 جایگاه متهم 15 محکمه 16 بندآب 17 واحد فشار *prep* به استثنای، مگر این که

**bar**[2] /bɑː(r)/ *noun*

یەکەی پەستان ◌ واحد فشار

ڕاگەیانـدنی ژنومێردایـەتی یـان هاوسـەرگیری (کلیسا) ◌ اعلان ازدواج

**banoffi pie** /bə'nɒfi/ *noun*, also banoffee pie

جۆرێ پای یان تارت (tart2)، لە مۆز، تافی و سەرتوێشکە دروست دەکرێ ◌ بانوفی پای

**banquet** /'bæŋkwɪt/ *noun*

بەزم، میوانی، بانگێشتن ◌ ضیافت

**banqueting** /'bæŋkwɪtɪŋ/ *adjective*

بانگێشتنی، میوانییانە: *a banqueting hall* ◌ وابسته به ضیافت

**banquette** /bæŋ'ket/ *noun*

1 بەرزایی نێو سەنگەر یـان خەنـەک، سـەکۆ (لە پشت شوورە) 2 مێز ◌ 1 بانکوت 2 نیمکت

**banshee** /bæn'ʃiː, US 'bænʃiː/ *noun*

بەنشی: لە چیرۆکە ئیرلەندییەکاندا، ڕۆحی ژنێ کە بە دەنگێکی خەمبارەوە هەواڵی مردنی یەکێ لە کەسانی نێوماڵ رادەگەیەنێ ◌ بن‌شی

**bantam** /'bæntəm/ *noun*

بەنتیم (جۆرێ مریشکی خانەکی چکۆلانە) ◌ بنتام

**bantamweight** /'bæntəmweɪt/ *noun*

بۆکسێر لە کێشی بەنتیمدا (نێوان 51 هەتا 53/5، زۆرانبـــازی 52 تـــا 57 کیلۆگـــرەم): *a bantamweight champion* ◌ خروس‌وزن

**banteng** /'bantɛŋ/ *noun*

(مالیزیـایی) جـۆرێ ڕێوی دارسـتانی باشـووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا [*Bos javanicus*] ◌ نـوعی روباه

**banter** /'bæntə(r)/ *noun*

شۆخی، گاڵتە، جەفەنگ، حەنەک ◌ مزاح

**bantering** /'bæntərɪŋ/ *adjective*

شۆخییانە، شۆخیبازانە، قۆشمانە، پێکەنینی، پێکەنیناوی، دۆستانە: *There was a friendly, bantering tone in his voice* ◌ شوخی‌آمیز، خنده‌دار

**banteringly** /'bæntərɪŋli/ *adverb*

بە شۆخییەوە ◌ با شوخی و مزاح

**Bantu** /ban'tuː, US 'bantuː/ *noun*

1 ئەندامی کۆمەڵێکی بەربلاوی گەلانی ڕەسەنی ناوەند و باشووری ئەفریکا 2 کۆمەڵی زمانانی Niger-Congo ی ئەو گەلانە کە بریتین لە Swahili، Xhosa و Zulu ◌ بانتویی

**banyan** /'bænjən/ = banian

**banzai** /ban'zʌɪ/ *adjective*

1 خۆکوژییانە، خۆکوژانە 2 (نافەرمی) درِ ◌ 1 انتحاری 2 بانزای

**banzai attack** *noun*

هێرش یـان پـەلاماری خۆکوژانـە ◌ حملـەی انتحاری

**baobab** /'beɪəubæb, US 'beɪou-/ *noun*

**Bar.** *abbreviation* Baruch (Apocrypha) (in biblical references)

**the Bar** /bɑ:(r)/ *noun*
پیشەی پارێزەری (لە دادگا بەرزەکاندا) ۞ حرفەی وکالت

**Barabbas** *noun*, Greek, from Aramaic *Bar-abba*
باراباس: زیندانی‌یێ کە بەپێی Matthew، Mark و John ئازاد کرا، بڕیار وابوو لە خاچ‌دری، بەلام بە فەرمانی پیاوانی جوولەکە لە جیاتی ئەو عیسا لە خاچ درا ۞ باراباس

**bara birth** /ˌbɑrə ˈbrɪθ/ *noun*
جۆرێ نان‌چایی خۆمالی ویلزی ۞ نوعی کیک چای ولزی

**barathea** /ˌbærəˈθɪə/ *noun*, from *Barathea*, a trademark
جۆرێ کوتالی لە خوری چاک، جاروبار لەگەل هەوریشم یان کەتان تێکەل دەکرێ ۞ باراتیا

**baraza** /bəˈrɑ:zə/ *noun*
(ئەفریکای رۆژهەلات) شوێنی کۆبوونەوەی گشتی ۞ بارازا

**barb**[1] /bɑ:b, US bɑ:rb/ *noun*
1 درۆو، چقل، تیکان، زی، لاس 2 چزوو 3 (قولاپی راوەماسی) نووک، سەر، سەری تیر 4 قسەی تال یان رەق 5 ریشال، کولکە 6 ریش، سمێل ۞ 1 خار 2 نیش 3 نوک، پیکان 4 نیش‌زبان 5 ریشه، کرک 6 ریش

**barb**[2] /bɑ:b, US bɑ:rb/ *noun*
نژادێکی ئەسپی چکۆلە، لە بنەڕەتا هی ئەفریکای باکووری ۞ بارب

**Barbadian** /bɑ:ˈbeɪdɪən/ *noun, adjective*
*n* بارابادۆسی *adj* Barbados سەربە ئەوێ یا خەلکەکەی ۞ باربادوسی

**barbarian** /bɑ:ˈbeərɪən, US bɑ:rˈber-/ *noun, adjective*
*n* 1 (لە سەردەمانی کۆندا) بەربەر، بێگانە (ب.ت. نایۆنانی، نارۆمی یان ناکریستانی): 2 *barbarian invasions of the fifth century* مرۆی درندە یان ناشارستانی *adj* بەربەر، هۆڤ، ناشارستانی، بێ‌ژیار، بیانی، دەرەکی، بێگانە ۞ *n* 1 بربر، بیگانه 2 آدم وحشی یا بی‌تمدن *adj* بربر، وحشی، بی‌تمدن، بیگانه

**barbaric** /bɑ:ˈbærɪk, US bɑ:rˈb-/ *adjective*
1 بێ‌شارستانیەت، بێ‌ژیار، درندە، هۆڤ، بەربەر، درندانە، بێ‌بەزەیی‌یانە، توندوتیژ، بەزەبروزەنگ: *The way* ◊ *a barbaric act/custom/ritual* 2 *these animals are killed is barbaric* سەربە بەربەرەکان 3 سادە، سەرەتایی ۞ 1 بی‌تمدن، وحشی، وحشیانه، سبعانه، خشن 2 وابسته به بربرها 3 ساده، ابتدایی

**barbarically** /-kli/ *adverb*
درندانە، بەشێوەیەکی بێ‌بەزەیی‌یانە: *These prisoners have been treated barbarically* ۞ به طور وحشیانه

**barbarism** /ˈbɑ:bərɪzəm, US ˈbɑ:rb-/ *noun*
1 درندایەتی، هۆڤیگەری، بەربەری‌یەت، رەفتار یان هەلس‌وکەوتی توندوتیژانە یان بێ‌بەزەیی‌یانە 2 نارۆشنبیری، بێ‌فەرهەنگی، بێ‌تۆرەیی: *the long, slow descent of the Roman Empire into barbarism* 3 وشە یان زاراوەی نارەسەن، هەلەی زمانی ۞ 1 وحشی‌گری، توحش، رفتار خشونت‌آمیز یا سبعانه 2 بی‌فرهنگی 3 واژه یا عبارت ناسره

**barbarity** /bɑ:ˈbærəti, bɑ:rˈb-/ *noun, pl.* barbarities
1 درندایەتی، هۆڤیگەری، درندەیی، بێ‌بەزەیییتی، دلڕەقی، خوێن‌ڕێژی: *The barbarity of the old regime was eventually exposed* 2 کردەوەی درندانە ۞ 1 وحشی‌گری، سبعیت، قساوت 2 عمل وحشیانه

**barbarous** /ˈbɑ:bərəs, US ˈbɑ:rb-/ *adjective*
1درندە، در، کێوی، هۆڤ، درندانە، بێ‌بەزەیی، دلڕەق، زۆردار، زالم، توندوتیژ، بەزەبروزەنگ: *the barbarous treatment of these prisoners of war* 2 بێگانە، بیانی، ناشارستانی، بێ‌فەرهەنگ، بێ‌رەوشت، بێ‌تۆرە، نارۆشنبیر 3 بەدەنگ‌وهەرا، پڕ لە زەنازەنا 4 سەر زمان‌نەکەوتوو ۞ 1 وحشی، سبع، وحشیانه، ظالم، بی‌رحم، خشن 2 بیگانه، بی‌تمدن، بی‌تربیت 3 پر سروصدا 4 غیرمصطلح

**barbarously** /ˈbɑ:bərəsli, US ˈbɑ:rb-/ *adverb*
درندانە، دلڕەقانە ۞ وحشیانه

**barbarousness** /ˈbɑ:bərəsnəs, US ˈbɑ:rb-/ *noun*
درندایەتی، درندەیی، دڕی، هۆڤیگەری ۞ وحشی‌گری، توحش

**Barbary ape** *noun*
مەیموونی بەربەری، رەسەنی باکووری رۆژاوای ئەفریکا، لە رەوەزەکانی Gibraltarدا دەبینرێ [*Macaca sylvana*] ۞ میمون بربری

**Barbary sheep** *noun*
مەڕی بەربەری (لە دەشتە بەرزەکانی باکووری ئەفریکادا دەبینرێ [*Ammotragus lervia*]) ۞ گوسفند بربری

**barbastelle** /ˌbɑ:bəˈstɛl, US ˈbɑ:bəstɛl/ *noun*
شەمشەمەکوێرەگوێ‌پانە [توخم *Barbastella*: دوو جۆرن] ۞ بارباستل

**barbecue** /'bɑ:bɪkju:, US 'bɑ:rb-/ *noun*
1 مەنقەڵ 2 گۆشتی برژاو، کەباب ◌ 1 منقل 2 کباب

**barbed** /bɑ:bd, US bɑ:rbd/ *adjective*
1 دڕکاوی، درووداری، دڕکوداڵاوی، چقڵاوی 2 تاڵ، ناخۆش: *barbed witticisms* 3 خاوەنی ریش، سمێڵدار، ریشدار ◌ 1 خاردار 2 نیشدار 3 دارای ریش

**barbed wire** *noun*
وایەری دڕکاوی، تێلبەند، تێلی دڕکین، ئاسندڕک: *a -bed wire fence* ◌ سیم خاردار

**barbel** /'bɑ:b(ə)l/ *noun*
1 ریش، سمێڵ (لە دەم و لمۆزی ماسی) 2 ماسیەریشنە، جۆرێ ماسی زلەی ئاوی شیرین، لە تیرەی carp، سمێڵ یان ریشی بە لای دەمییەوە شۆڕ بۆتەوە [*Barbus barbus*] ◌ 1 ریش 2 نوعی ماهی

**barbell** /'bɑ:bel, US 'bɑ:rbel/ *noun*
باربێل، قورسە، ئالتیر (alter لە فەرەنسییەوە) ◌ باربل

**barber** /'bɑ:bə(r), US 'bɑ:rb-/ *noun*
سەلمانی، سەرتاش، جوانکار (پیاوانە) ◌ آرایشگر

**barberry** /'bɑ:bərɪ, US -bərɪ/ *noun, pl.* barberries
سەرچک، زرشک، زی، کشمیش کەولی، مێوژەسوورە [*Berberis vulgaris* و جۆرەکانی تر] ◌ زرشک

**barber's** *noun*
سەلمانی، سەرتاشخانە (پیاوانە) ◌ آرایشگاه

**barbershop** /'bɑ:bəʃɒp, US 'bɑ:rbərʃɑ:p/ *noun*
1 سەلمانی، سەرتاشخانە 2 جۆرێ گۆرانی چوارکەسە (لە ئەمریکا) ◌ 1 آرایشگاه، سلمانی 2 باربرشاپ

**barbet** /'bɑ:bɪt/ *noun*
باربێت (= چەندین جۆری باڵندەی دەنگخۆشی مێوەخۆری رەنگینی ناچۆلەکەیی nonpasserine و زۆرتر هی گەرمێنان tropical، [خێزانەکانی Capitonidae، Lybiidae و Megalaimidae]، بە دەنووکی ئەستوور و مووی زبر و تیژ لە بنەوەیان) ◌ باربت

**barbette** /bɑ:'bet/ *noun*
1 تەپ و گرد بۆ دابەستنی تۆپ 2 (لەنێو کەشتی شەڕکەردا) سەنگەری تەقاندنەوەی تۆپەکان ◌ باربت

**barbican** /'bɑ:bɪk(ə)n/ *noun*
قەڵای پێشەوە، قەڵاوشوورە، قەڵای بەرگری ◌ برج دفاعی

**barbicel** *noun*
پەڕچە، پەڕۆچکە، ریشاڵی باریکی پەڕ ◌ پرچه

**barbie** /'bɑ:bi, US 'bɑ:rbi/ = barbecue

**barbitone** /'bɑ:bɪtəʊn/ *noun*, also barbital /'bɑ:bɪt(ə)l/
باربیتۆن (دەرمانێکی جۆری barbiturate) ◌ باربیتون

**barbiturate** /bɑ:'bɪtʃʊrət, US bɑ:r'b-/ *noun*
1 باربیتیوریت (= دەرمانی خەو و هێوربوونەوەن و چەند جۆرێکن) 2 (کیمیا) خوێ یان ئیستێری ترشەڵۆکی باربیتۆریک ◌ باربیتورات

**barbituric acid** /ˌbɑ:bɪ'tjʊərɪk, US -'tʃʊərɪk/ *noun*
(کیمیا) ترشەڵۆکی باربیتۆریک: جۆرێ ئاوێتەی ئەندامی دەسکرد $C_4H_4N_2O_3$، لەوەوە باربیتورێتەکان بەرهەم دێنرێن ◌ اسید باربیتوریک

**barbotine** /'bɑ:bətɪn/ *noun*, from French
لۆعاب یان قوڕاو بۆ نەخشاندنی گڵێنە و گۆزەگەری ◌ باربوتین

**barbule** /'bɑ:bju:l/ *noun*
ریشکە، ریشۆ(چە)کە، درووی یا پەڕی چکۆلانە، تووک یا مووی ورد (بنەڕەت: لە *barbula* لاتین، چکۆلێنراوی *barba* "ریش") ◌ خار یا پر کوچک

**barbwire** = barbed wire

**barcarole** /'bɑ:kərəʊl, ˌbɑ:kə'rəʊl/ *noun*, also barcarolle /-rɒl, -'rɒl/
بارکارۆل 1 (گۆرانی دەریاوانە تفەنگدارەکان) 2 سروود یان گۆرانی بەلەمەوان یان گەمییەوانەکانی ڤێنیز ◌ بارکارول

**Barcelona chair** *noun*
کورسی یان سەندەڵی بارسیلۆنا: بێدەسک و دۆشەکەکانی چەرمپۆش کراون (بنەڕەت: لە *Barcelona*، سپانیا) ◌ صندلی بارسلونا

**barchan** /'bɑ:k(ə)n/ *noun*
تەپۆڵکەلمی داسی، لە دەشتەکانی تورکستان (بنەڕەت: لە barkhan تورکیک یان Kazakh ـەوە) ◌ برخان

**bar chart** *noun*, also bar graph
هێڵکاری (ئە)ستوونی یا میلی یا میلمیل، دیاگرامی شیشی ◌ نمودار میله‌ای

**bar code** *noun*
نیشانەی ستوونی، هێماهێڵ، نیشانهێڵ، نیشانمیل ◌ بارکد

**Barcoo** /bɑ:'ku:/ *noun*
(نافەرمی) سەربە ناوچە دوورەکانی نێوەوەی ئەوسترالیا ◌ بارکو

**bard** /bɑ:d, US bɑ:rd/ *noun*
1 هەڵبەستوان، هۆنەر (ب.ت. هەڵبەستی پاڵەوانێتی) 2 (the Bard) شێکسپیەر 3 (Bard) هەڵگری خەلاتی بۆ هۆنراوەی ویلزی لە Eisteddfod 4 شایەری گەڕۆک 5 زرێی ئەسپ ◌ 1 شاعر 2 و 3 بارد 4 شاعر دوره‌گرد 5 زره اسب

**bardic** *adjective*
هۆنەرانە، سەربە هۆنەران ۞ شاعرانە، وابسته بـه شاعران

**bardie** /'bɑ:di/ *noun*, also bardee or bardy
(ئەوسترالیا) پرگ یان قوزاخەی خۆراکی هێندێ مێروو ۞ باردی

**bardo** /'bɑ:dəʊ/ *noun*
(لە بوودائیزمی تەبەتی‌دا) دۆخی نێوان مەرگ و بوونەوە ۞ باردو

**bardolater** *noun*
شەکسپیەرپەرست ۞ شکسپیرپرست

**bardolatry** /bɑ:'dɒlətri/ *noun*
(بە شۆخی) شەکسپیەرپەرستی ۞ شکسپیرپرستی

**Bardolino** /ˌbɑ:də'li:nəʊ/ *noun*
باردۆلینۆ: مەی سووری ناوچەی Venetoی ئیتالیا ۞ باردولینو

**bare** /beə(r), US ber/ *adjective* (barer, barest)
1 رووت، کرال، رووتەن، رووتەڵ، پەتی، قوتین (سەر)، بێبەرگ، رووتاوە، رووت‌وقووت، سەلت‌وقوت، قووت، دانەپۆشراو، کرۆسک 2 بێ 3 تەنیا، تەنێ، فەقەت 4 خاڵی، بەتاڵ، تیانەبوو 5 بنگەهی، بنەرەتی، سەرەکی، گرنگ 6 سادە، نەرازاو ۞ 1 برهنه، لخت 2 بدون، فاقد 3 فقط، تنها، صرف 4 خالی 5 بنیادی، اساسی 6 ساده

**bareback** /'beəbæk, US 'berb-/ *adverb, adjective*
بێزین، رووت (ئەسپ) ۞ بدون زین

**barebacked** *adjective*
بێزین، رووت ۞ بدون زین

**bareboat** *noun*
(گەمی یان کەشتی) بەکرێ گیراوە بەبێ کارکەرانی ۞ باربوت

**bare bones** *noun, pl.*
راستی‌یە بنچینەیی‌یەکان، بنچینەیی، بنەرەتی، بنگەهی، سەرەکی ۞ اصول، حقایق بنیادی، مبانی

**barefaced** /'beəfeɪst, US 'berf-/ *adjective*
1 دەم‌وچاورووت؛ beardless؛ بێدەمامک 2 بێشەرم، رووهەڵماڵراو، بێئابروو، رووودار، بێچاوورووو؛ unconcealed ,open ۞ 1 بارفیست؛ بدون نقاب 2 وقیح، پررو

**barefacedly** /'beəfeɪstli, US 'berf-/ *adverb*
بێشەرمانە، رووهەڵماڵراوانە، رووودارانە ۞ وقیحانه

**barefacedness** /'beəfeɪstli, US 'berf-/ *noun*
بێشەرمی، رووهەڵماڵراوی، رووداری ۞ وقاحت، پررویی

**barefoot** /'beəfʊt, US 'berf-/ *adverb, adjective*, also barefooted (less frequent)
بێپەتی، بێخاوسی، خواس، بە پێی پەتی: *poor children going barefoot in the street* ۞ با پای برهنه

**barefoot doctor** *noun*
دوکتور یان پزشکی بێبەتی، پزیشکی بێخاوس (لە ناوچە لادێیی‌یەکانی چین) ۞ دکتر پابرهنه

**barège** /bə'reɪʒ/ *noun*
(فەرەنسی) جۆرێ پارچەی هەوریشمی سووکی تۆری بۆ کراس، لە خوری دروست دەکرێ (بنەرەت: لە ناوی دێی *Barèges* لە باشووری رۆژاوی فەرەنسە، لە بنەرەتا ئەو کوتاڵە لەوێ دەکرا) ۞ نوعی پارچه

**barehanded** *adjective, adverb*
بێدەسکێش، بە دەستی رووتی، بێچەک ۞ بدون دست‌کش، بدون اسلحه

**bareheaded** /ˌbeə'hedɪd, US ˌber'h-/ *adjective*
سەرپەتی، بێکڵاو، سەررووت، سەرقوتین: *went -reheaded in the hot sun* ۞ سربرهنه

**barelegged** *adjective*
بە پێی رووتەوە، بە پێی پەتی‌یەوە، بێگۆرەوی ۞ با پای برهنه

**bare-knuckle** *adjective*, also bare-knuckled
(بۆکس) بێدەسکێش، بە دەستی رووت ۞ بدون دست‌کش

**barely** /'beəli, US 'berli/ *adverb*
1 بەزۆر، بەسەختی 2 تەنیا 3 بەئاشکرایی، رەپ‌وراست، ریک‌وراست ۞ 1 بە زحمت 2 فقط 3 صاف و پوست کنده

**bareness** /beənəs, US bernəs/ *noun*
رووتی، پەتیتی، بێبەرگی ۞ لختی

**barf** *noun*
رشانەوە، هێنانەوە، فەرەشیان، چێشتی رشاوە یا رشاوەی لە چێشت ۞ استفراغ، غذای استفراغی

**barfly** /'bɑ:flʌɪ/ *noun, pl.* barflies
(ئافەرمی) مەیخانەباز ۞ بارفلی

**bargain** /'bɑ:gən, US 'bɑ:rgən/ *noun, adjective*
1 سەودا، مامەڵە، ئاڵوویر 2 پێکهاتن، سازان، رێککەوتن 3 هەرزان، کەڵەپوور، ئەندازە، نرخ‌باش ۞ 1 معامله 2 توافق 3 با تخفیف، ارزان

**bargain counter** *noun*, also -gain basement
بەشی هەرزان‌فرۆشی (فرۆشگە یان دووکانێ) ۞ قسمت حراجی

**bargainer** *noun*
سەوداگەر، سەوداچی، مامەڵەچی ۞ معامله‌گر

**bargain hunter** *noun*
هەرزانگر ۞ بزبگیر

**bargain hunting** *noun*
هەرزانگری ۞ بزبگیری

**bargaining** /'bɑ:gənɪŋ, US 'bɑ:rg-/ *noun*
دان‌وستان، چەنەلێدان، وت‌وویژ ۞ چانه‌زنی

**bargaining chip** *noun,* also bargaining counter
هۆکار یان فاکتێری یاریدەدەر ۞ اهرم فشار

**bargaining position** *noun*
پۆزەیشنی دانوستان یان چەنەلێدان ۞ موضع مذاکره

**bargaining power** *noun*
هێز یان توانایی دانوستان یان چەنەلێدان، هێزی چوونەپێشەوە بۆ دەسخستنی هەلومەرجی باشتر ۞ قدرت چانەزنی

**bargaining table** *noun*
مێزی دانوستان (سیاسی) ۞ میز مذاکره

**barge** /bɑ:dʒ, US bɑ:rdʒ/ *noun*
1 بارج، بەلەمی بارهەلگر، پانکەبەلەم، گەمی رابواردن 2 گەمی یان بەلەمی فەرماندەری ۞ 1 دوبه 2 بارج

**bargee** /bɑ:'dʒi:, US bɑ:r'dʒi:/ *noun*
بارجەوان، بارجاژۆ ۞ دوبه‌ران

**bargeman** /'bɑ:'dʒimən/ *noun, pl.* bargemen
بارجەوان، بارجاژۆ ۞ دوبه‌ران

**barge pole** /'bɑ:dʒpəʊl, US 'bɑ:rdʒpoʊl/ *noun*
داری رێنوێنی بارج ۞ چوب هدایت دوبه

**bar graph** = bar chart

**baric** *adjective*
سەربە باریۆم، پێوەندی بە باریۆمەوە هەیە ۞ وابسته به باریوم

**barilla** /bə'rɪlə/ *noun*
ئەلکالیی (ناپوخت) کە لە خۆلەمێشی گیاخوێ و رووەکی تر ساز دەکرێ ۞ قلیای قمی

**barite** /'barʌɪt, US 'bɛ:-/ = baryte

**barista** /bə'ri:stə, US -'ris-: bæ-/ *noun*
کەسێ کە لە coffee bar دا کار دەکا ۞ باریستا

**baritone** /'bærɪtəʊn, US -toʊn/ *noun*
بنگر، ژێربۆر یان ژێرگر، بەریتۆن (دەنگی نێوەڕاستی پیاو نێوان تێنۆر tenor و باس bass)، پیاوێ بە دەنگی بەریتۆنەوە ۞ باریتون

**barium** /'beəriəm, US 'ber-/ *noun*
1 (کیمیا) باریۆم (بە ژ.گ. 56، ن. Ba) 2 = barium sulfate ۞ باریوم

**barium meal** *noun*
میلی باریۆم، سولفاتی باریۆم (مەتریالێ کە باریۆمی تێدایە و دوکتورەکان دەیدەن بە نەخۆشەکان تا قووتی دەن، پێش خستنەبەر تیشکی ئیکس x-ray، تا لە ئەنجامدا ئەندامانی لەشیان چاتر ببینرێ) ۞ میل باریوم

**barium sulphate** *noun*
insoluble جۆرێ ئاوێتەیێکی نەتوواوەی compound کریستالی $BaSO_4$، وەک پیگمێنت یان ئیسکتێندێر بەکاردێنرێ ۞ سولفات باریوم

**bark**[1] /bɑ:k, US bɑ:rk/ *noun*
1 واقەواق، وەڕە، گەف، قروسکەقروسک، سەگوەڕ، حەپەحەپ 2 گرمە یان قریوەی چەک و تفەنگ، نەعرەتە ۞ 1 واقواق 2 غرش، عربده

**bark**[2] /bɑ:k, US bɑ:rk/ *noun*
(تو)تەلاش، توێخلی دار، قالشت، توک، توێکلی دار، پێستی دار، خەلەف ۞ پوست درخت

**bark**[3] /bɑ:k, US bɑ:rk/ *noun*
1 (کۆن، وێژەیی) کەشتی، گەمی، بەلەم 2 بارک (جۆرێ کەشتی چارۆکەدار، بارکاس (رووسی)) ۞ 1 (ادبی) کشتی، قایق 2 بارک

**bark beetle** *noun*
قالۆنچەی توێکل [خێزان Scolytidae: زۆر جۆرن] ۞ نوعی سوسک

**barkeeper** *noun*
مەیخانەدار، خاوەنمەیخانە، مەیخانەگێر ۞ صاحب بار

**barkentine** *noun,* also barquentine
بارکێنتین (جۆرێ کەشتی گەورەی بادەوەدارە) ۞ بارکنتاین

**barker** /'bɑ:kə(r), US 'bɑ:rk-/ *noun*
(نافەرمی) بانگەوازکەر، هاوارچی، جارچی (بۆ سەرنجڕاکێشانی کڕیارەکان) ۞ جارچی

**barking deer** = muntjac

**barking mad** *noun,* also barking
شێتی شێت، شێتوشێواو، تەواوشێت، شەلوشێت ۞ خل خل

**barky** *adjective*
(تو)تەلاشئاسا، وەکوو توێخلی دار، توێکلئاسا ۞ مانند پوست درخت

**barley** /'bɑ:li, US 'bɑ:rli/ *noun*
(رووەکناسی) جۆ، جەهـ یەو، یەوی [تۆخم *Hordeum*] ۞ جو

**barleycorn** *noun*
دەنکەجۆ، دەنکی جۆ (پێوەر یان ئەندازەیێکی کۆنە بە درێژی سێیەکی ئینچ) ۞ دانەی جو

**barleymow** *noun*
کۆماجۆ، لۆدەجۆ ۞ تودەی جو

**barley sugar** *noun*
نەباتاو، ئاونەبات ۞ آب نبات

**barley water** *noun*
ئاوجۆ، ئاووجۆ، بیرە ۞ آبجو

**barley wine** *noun*
ئەیلی بەقەوەتی ئینگلیسی ۞ ایل قوی انگلیسی

**barm** *noun*
1 (کۆن) ترشێنە(ر)، هەوێن، ئامێزەن، ئامیان، مایە، هەویرترش، شلکێنە 2 کەفی سەر مالتی لیکۆر ۞ 1 مخمر، خاره 2 بارم

**barmaid** /'bɑ:meɪd, US 'bɑ:rm-/ *noun*
مەیگێڕ (ژن) ۞ ساقی

**barman** /ˈbɑːmən, US ˈbɑːrmən/ *noun, pl.* barmen /-mən/
(زۆرتر لە بریتانیا) مەیگێر ◌ ساقی
**barmbrack** *nouns*
جۆرێ نانی تیژی نەرم کە میوەی وشکەوەبووی تیایە و لە بنەڕەتا هی ئیرلەندە (لە *bairin breac* ئیرلەندی "کەیکی کونج‌کونج") ◌ نوعی نان
**Barmecidal** *adjective*
(ویژەیی) خەیالی، ئەندێشەیی ◌ خیالی
**Barmecide** /ˈbɑːmɪsʌɪd/ = Barmecidal
**Barmecide feast** *noun*
بەزم (وەزمی) خەیالی، جەژن یا سووری خەیالی ◌ سور خیالی
**bar mitzvah** /ˌbɑː ˈmɪtsvə, US ˌbɑːr/ *noun*
بارمیتسڤا (مناڵێکی جوولەکە کە دەگاتە تەمەنی (13 ساڵان) خوێنسین، وادەزانێ کە کۆمەڵە بەرپرسایەتییەکی دینی وەک گەورەساڵان لەسەر شانیەتی؛ بنەڕەت: لە *bar miṣwāh* عیبری "کوڕی فەرمان") ◌ بار میتسوا
**barmy** /ˈbɑːmi, US ˈbɑːrmi/ *adjective* (barmier, barmiest)
(نافەرمی) شێت، دەلوو، گەوج، کەر ◌ دیوانە، احمق
**barn**[1] /bɑːn, US bɑːrn/ *noun*
1 کادین، مەرەک 2 تێولە، تەویلە، پشتێر، گەوڕ (لە کێڵگەدا) 3 عەمار، عەماری، خەڵەدان، دەغڵدان ◌ 1 کاهدان 2 طویله 3 انباری
**barn**[2] /bɑːn, US bɑːrn/ *noun*
(فیزیک) بارن (کورتەکەی b) ◌ بارن
**Barnabas** *noun*
بارناباس: یەکێ لە یارانی Paul ی حەواری، لە یەکەم سەفەرەکانی راگەیاندن و مزدەبەریدا لەگەڵی بووە ◌ بارناباس
**barnacle** /ˈbɑːnəkl, US ˈbɑːrn-/ *noun*
1 بارنیکێل، نووسە(نـ)کە، بارناکێل: جۆرێ گیانەوەری لەش‌نەرم کە بە بەرد یان بنی کەشتی‌یەوە دەنووسێ [پۆل Cirripedia: زۆر جۆرن] 2 (خوازە) گەنە، کلک، لە کۆڵەوەنەبوو، چەقە (لە *bernaca* لاتینی سەدەکانی نێوەڕاست) ◌ 1 بارناکل 2 (مجازی) کنه
**barnacle goose** *noun*
قازە نووسە(نـ)کە، قازی بارنیکێل [ *Branta leucopsis*] ◌ نوعی غاز
**barn burner** *noun*
(نافەرمی، ئەمریکا) رووداوی زۆر وورووژێنەر، ب.ت. لە وەرزشدا: *the game should be a real barn burner* ◌ رویداد مهیج
**barn dance** *noun*
سەما یا هەڵپەرکێی خۆجێی یان نەریتی، بۆنەیەکی نافەرمی کۆمەڵایەتی کە ئەو سەمایەی تیا دەکرێ ◌ رقص محلی یا سنتی، بارن دانس
**barn door** *noun*
دەرگای عەماری ◌ در انباری
**barnet** /ˈbɑːnɪt/ *noun*
(نافەرمی، بریتانیا) مووی مرۆ ◌ موی آدم
**barney** /ˈbɑːni, US ˈbɑːrni/ *noun, pl.* barneys
(لە بریتانیا و نافەرمی) کێشەوهەرا، بگرەوبەردە، جەنجاڵی ◌ الم‌شنگه
**bar none** *adverb*
بێ‌هەڵاواردن، بێ‌ئاوارتە ◌ بدون استثنا
**barn owl** *noun*
کوندەسپی [*Tyto alba* و جۆرە پێوەندیدارەکان] ◌ جغد سفید
**barnstormer** *noun*
وتاردەری رامیاری یان سیاسی، بارن‌ستۆرمێر ◌ بارن‌ستورمر
**barnstorming** /ˈbɑːnstɔːmɪŋ, US ˈbɑːrnstɔːrmɪŋ/ *noun*
وتاردەریی سیاسی، بارن‌ستۆرمینگ (شوێن‌بەشوێن گەڕان بۆ وتاردانی سیاسی یان پیشاندانی شانۆکان) ◌ بارن‌ستورمینگ
**barnyard** /ˈbɑːnjɑːd, US ˈbɑːrnjɑːrd/ *noun*, also farmyard
حەوشەی عەمار یان خەڵەدان ◌ حیاط انباری
**baro-** /ˈbarəʊ/ *prefix*
پێشگر: قورسایی، گرانی، قورسی، گوشار، پەستان، پاڵەپەستۆ: (لە *barometer* *baros* یۆنانی‌یەوە "weight") ◌ پیشوند: سنگینی، فشار
**barogram** *noun*
پەستان‌گرام، بارۆگرام ◌ باروگرام
**barograph** /ˈbærəgrɑːf, US -græf/ *noun*
پەستان‌گراف، بارۆگراف ◌ باروگراف
**Barolo** /bəˈrəʊləʊ/ *noun, pl.* Barolos
جۆرێ مەی سووری بەقەوەتی تاڵ بارۆلۆ (دێیێکی ناوچەی Piedmont)، هی باکووری رۆژاوای ئیتالیا ◌ بارولو
**barometer** /bəˈrɒmɪtə(r), US -ˈrɑːm-/ *noun*
1 پەستان‌پێو 2 جیاکار، شتێ کە ئاماژە بە گۆڕانێ دەکا (وەکوو رای گشتی، نرخەکانی بازار و هتد): *housing sales and other economic barometers* = 3 test ،standard ◌ 1 بارومتر 2 شاخص
**barometric** /ˌbærəˈmetrɪk/ *adjective*, also barometrical
کەشی، سەربە کەش (barometrically *adv*) ◌ جوی، مربوط به جو
**barometric pressure** *noun*
پەستانی کەش، هەروەها atmospheric pressure ◌ فشار جو

**barometry** /bə'rɒmɪtrɪ/ *noun*
پەستانپێوی ۞ بارومتری

**baron** /'bærən/ *noun*
1 بارون، گەورەزادە (لە بریتانیا، خوارتر لە viscount) 2 کەڵ، بەدەسەڵات (لە کاروبار یان پیشەسازیدا) ۞ 1 بارون 2 سلطان

**baronage** /'bærənɪdʒ, US 'berənɪdʒ / *noun*
بارۆنەکان، کۆمەڵی بارۆنەکان ۞ بارونها

**baroness** /'bærənəs, US ˌbærə'nes/ *noun*
بارۆنیس، بارۆنژن (لە بریتانیا و بۆ ژنان) ۞ بارونس

**baronet** /'bærənət/ *noun*
بارۆنێت (لە بریتانیا، خوارتر لە baron و سەرتر لە knight) ۞ بارونت

**baronetage** *noun*
کۆمەڵی بارۆنێتەکان ۞ جماعت بارونها

**baronetcy** /'bærənətsi/ *noun*
پلەوپایە یان ناونیشانی بارۆنێت ۞ رتبە یا عنوان بارونت

**baronial** /bə'rəʊniəl, US -'roʊ-/ *adjective*
گەورەزادەیی، بارۆنی ۞ اشرافی

**barony** /'bærəni/ *noun, pl.* baronies
1 پۆست یان پلەوپایە یان زەویوزاری بارۆنی 2 (لە سکاتلەند) زەویوزاری بەربلاوی دەرەبەگ ۞ بارونی

**baroque** /bə'rɒk, US bə'roʊk/ *noun, adjective*
*n* بارۆک، شێوازی هونەری، موسیقایی و ب.ت. بیناسازی لە ئەوروپا و لە سەدەکانی 17 و 18دا) *adj* ئاڵۆز، تێکئاڵاو ۞ *n* باروک *adj* پیچیده

**baroque architecture** *noun*
بیناسازی یان خانەڕێژی بارۆک یان بەراک ۞ معماری باروک

**barouche** /bə'ru:ʃ/ *noun*
(مێژوویی) جۆرێ کالیسکەی چوارچەرخەی ئەسپی ۞ نوعی کالسکە

**barque** /bɑ:k, US bɑ:rk/ = barkentine

**barquentine** /'bɑ:k(ə)nti:n/ = US barkentine

**barracking** *noun*
هۆلیکردن، ناپەسندکردن، دژایەتیکردن ۞ عمل هوکردن

**barracks** /'bærəks/ *noun, pl.*
سەربازخانە، بنکە، سەربازگە، سپاخانە ۞ پادگان، قرارگاه

**barracoon** /ˌbarə'ku:n/ *noun*
(مێژوویی) دیواربەندێ کە کۆیلە ڕەشەکانیان بۆ ماوەیێ تیا رادەگرت (بنەڕەت: لە *barracón* سپانیایی، لە *barraca* "barracks") ۞ باراکون

**barracouta** /ˌbarə'ku:tə/ *noun, pl.* same or barracoutas
1 جۆرێ ماسی درێژی ئۆقیانووسە باشوورییەکان، لەباری خۆراکییەوە یەکجار بەنرخە [*Thyrsites atun*] 2 (نیوزیلەند) نانی درێژ ۞ باراکوتا

**barracuda** /ˌbærə'kju:də, US -'ku:də/ *noun, pl.* same or barracudas
باراکودا (جۆرە ماسییەکی گەورە و دڕ، بە ددانی تیژەوە و لە ئاوە گەرمەکاندا دەژی [توخم *Sphyraena*: چەندین جۆرن]) ۞ باراکودا

**barracudina** /ˌbarəku:'di:nə/ *noun*
جۆرێ ماسی راوی باریکەڵەی سەردرێژ، هی ئۆقیانووسە ئازادەکان [*Paralepis atlantica* و جۆرەکانی تر] ۞ باراکودینا

**barrage** /'bærɑ:ʒ, US bə'rɑ:ʒ/ *noun*
1 بەنەبەندکە، بناوان، ئەنباراو، ئاوگر 2 هێرشی لەسەریەک، هێرشباران، ڕەهێڵەباران، ڕێژنە ۞ 1 سد 2 سد آتش، حملات پیاپی، رگبار

**barrage balloon** *noun*
باڵۆنی بەرگری (بۆ زۆر نزمنەبوونەوەی فڕۆکەی دوژمن) ۞ بالون دفاعی

**barramunda** *noun, pl.* barramundas
بارامونـدا، ماسی رووبار (لە ئەوستراليا و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا [*Neoceratodus forsteri*]) ۞ باراموندا

**barramundi** /ˌbærə'mʌndi/ *pl.* same or barramundis = barramundi

**barranca** /bə'raŋkə/ *noun,* also barranco, *pl.* barrancas or barrancos
(ئەمریکا) شیوی رووباری پێچاوپێچی تەنگ و باریک ۞ بارانکا

**barrator** *noun*
1 کەسێ کە کاری کڕین و فرۆشتنی پلەوپایەی حکومی و دینی (یان کلێسە، بە پارە) دەکا 2 شەڕنەردوە، شەڕەنگێز، شەڕانی، سەربەگۆبەند 3 دادگەری بەرتیلخۆر ۞ 1 باراتور 2 مرافعەجو، دعوایی 3 قاضی رشوەگیر

**barratry** /'barətri/ *noun*
1 (کۆن) کەمتەرخەمی کەشتییەوان یان دەستەی کارکەرانی کەشتییێ 2 کڕین و فرۆشتنی پلەوپایەی حکومی و دینی (یان کلێسە) بە پارە 3 شەڕنانەوە، شەڕەنگێزی ۞ 1 باراتری 2 مرافعەجویی

**barred** /'bɑ:d/ *adjective*
1 نەردەدار، نەردەڕێز، نەردە یان تووڵکلێدراو، نەرداوی 2 گیراو، داخراو، بەستراو ۞ 1 دارای نرده 2 مسدود، بسته

**barred owl** *noun*
جۆرێ کوندەی زلەی ئەمریکای باکووری [*Strix varia*] ۞ نوعی جغد

**barrel** /'bærəl/ *noun*

1 پیپ، بەرمیل، کوس، کووپەدارینە، بۆشکە 2 بۆری، (تفەنگ) لوولە 3 جەوهەردان (پاندین) 4 جێگـای زەمبەلـەک لـە سـەعاتدا 5 لۆدەیـی، دنیایی، بڕێکی زۆر ◌ 1 بشکە 2 لولە 3 مخزن 4 بارل 5 مقدار زیاد

**barrel cactus** *noun*
(ڕووەکناسی) کاکتوسی کوسی (هی مەکسیکو [توخمەکانی *Echinocactus* و *Ferocactus*]) ◌ نوعی کاکتوس

**barrel-chested** *adjective*
خاوەنی سنگی گەورە و خڕ ◌ دارای سینەی بزرگ و گرد

**barreled** *adjective*
بەرمیلی، کوسی، بۆشکەیی ◌ بشکەای

**barrelfiller** *noun*
بۆشکەپڕکەر، بەرمیلپڕکەر ◌ بشکەپرکن

**barrelfish** *noun, pl.* same or barrelfishes
ماسیپەکوسە، کووپەماسی، هی ئەتلانتیک [*Hyperoglyphe perciforma* و *Schedophilus medusophagus*] ◌ نوعی ماهی

**barrelhead** *noun*
سەری تەختی بەرمیل یان کوسێ ◌ بارلهد

**barrelhouse** *noun*
مەیخانەی چکۆلە ◌ بار کوچک

**barrel organ** *noun*
ئۆرگی لوولەیی یان دەستی ◌ ارگ دندانەای

**barrel-vault** *noun*
(بیناسازی) تاقی نیولوولەکی، تاقی لانکەیی ◌ تاق ضربی

**barren** /'bærən/ *adjective*
1 بووره، بەیار، شۆرەکات، ڕووتەن، مووش، نەکێڵ، خەرشۆف، وشک، قاقڕ: *a barren desert* بێبەر، زڕ، خرس، پەرک (دار)، بێبەرهەم، بەیچەڵ، نەزۆک، ستێور، قرد 2 بێهوودە، بێئەنجام، بێنرخ، بێبرەو، بێبایەخ، چیزۆ: *The team will come through this barren patch and start to win again* ◌ 1 بایر، لمیزرع، بیثمر، نازا 2 بیهودە، بیارزش

**barrenness** /'bærənnəs/ *noun*
ڕووتەنی، نەکێڵی، بوورەیی، نەزۆکی، بەیچەڵی ◌ لمیزرع بودن، نازایی

**barrenwort** *noun*
جۆرێ گیای خشۆک یان تەرزخەر، جاران باوەڕ وابوو کە دەبێتەهۆی بێبڕشتی [توخم *Epimedium*] ◌ نوعی گیاه

**barrette** /bæ'ret/ *noun*
گیرەی سەر، قژگیرە، گوڵی سەر ◌ کلیپس

**barricade** /ˌbærɪ'keɪd/ *noun*
1 چەپەر، خەڵ، پەرێز، سەنگەر، مەتەرێز 2 دیوار، کۆسپ، بەربەست: *a barricade made of doors, chairs and broken tables* *The police stormed the -des the demonstrators had put up* ◌ 1 سنگر 2 مانع، سد

**barrier** /'bæriə(r)/ *noun*
کۆسپ، بەربەند، بەربەست، دیوار، ڕێگر: *The crowd had to stand behind barriers* *the removal of trade barriers* ◌ مانع، رادع، بازدار، حائل

**barrier cream** *noun*
کریمی پاراستنی پێست ◌ کرم پوست

**barrier method** *noun*
شێوازی کۆسپ یان بەربەست (بۆ نازگیری) ◌ روش مانع

**barrier reef** *noun*
شۆستە یان دیوارەی شیلانی ◌ آبسنگ مرجانی

**barring** /'bɑːrɪŋ/ *preposition*
مەگەر ئەوەی کە، بێجگەلە، جگە: *Barring accidents, we should arrive on time* ◌ مگر این کە، بجز، بە استثنای

**barrio** /'bɑrɪəʊ/ *noun, pl.* barrios
گەڕەک، لە ولاتانی سپانیاییزماندا ◌ منطقە

**barrister** /'bærɪstə(r)/ *noun*, also barrister-at-law
(زۆرتر بریتانیا) پارێزەر، ئەولەکار، ناوکات ◌ وکیل مدافع

**barroom** /'bɑːruːm, US -rʊm/ *noun*
(زۆرتر ئەمریکا) مەیخانە، مەیفرۆشی ◌ بار

**barrow**[1] /'bærəʊ, US -roʊ/ *noun*
1 دەستەبەر، فەرغوون (دووچەرخ و زۆرتر لە لایەن دەسفرۆشانی سەر شەقام بەکاردێتێ) 2 قورکێش، ناوە، ئەستەمولی 3 بەرازی خەساو (بەرلە پێگەیشتنی ڕەگەزی) ◌ 1 چرخدستی 2 زنبە 3 خوک اختە

**barrow**[2] /'bærəʊ, US -roʊ/ *noun*
tumulus کۆما گڵی سەر قەبر، گلکۆ، گۆڕپشتە، ◌ گورپشتە

**barrow boy** *noun*
دەسگێڕ، کوڵگێڕ، فەرغوونگێڕ ◌ دستفروش

**Barsac** /'bɑːsak, French baʀsak/ *noun*
جۆرێ مەی شیرینی سپی، هی ناوچەی بارساک لە باشووری ڕۆژاوای فەرەنسە ◌ بارساک

**Bart** /bɑːt, US bɑːrt/ = Baronet

**bartender** 'bɑːtendə(r), US 'bɑːrt-/ = barman

**barter** /'bɑːtə(r), US 'bɑːrt-/ *noun*
ئاڵشت، ئاڵوویر، ئاڵوگۆڕ، گۆڕینەوە ◌ معاملەی پایاپای، معاوضە

**Bartholin's gland** /'bɑːtəlɪnz/ *noun*
ڕژێنەی بارتولین (هەریەک لەو جووتە ڕژێنەی کونی شەرمی ژن کە شلەیێ دەردەدا تا ئەوێ چەور کا) ◌ غدەی بارتولین

**bartsia** /'bɑːtsɪə/ *noun*

جۆرێ رووەکی پرگزوگەڵا لە تیرەی figwort [*Odontites verna* (هی سوور) و جۆرەکانی تر] ۞ بارتیا

**bartizan** *noun*

کۆنگرەی سەرووی کەلوو یان قوللە یان برج ۞ برجک پیش‌کرده

**Baruch** *noun*, Late Latin, from Greek *Barouch*, from Hebrew *Bārūkh*

باروک، باروچ، باروخ (عیبری): کتێبێکی ئامۆژگاری‌یانە homilectic و قانوونی شەرعی کلێسەی رۆم، سەربە پەیمانی کۆن ۞ باروخ

**barwing** *noun*

(باڵندەناسی) جۆرێ باڵندەی ئاسیایی لە تیرەی babbler [توخم *Actinodura*] ۞ نوعی پرنده

**barycentre** *noun*

چەق یان ناوەندی راکێشان ۞ باریستر

**barycentric** /ˌbarɪˈsɛntrɪk/ *adjective*

سەربە چەق یان ناوەندی راکێشان ۞ باریستریک

**barytone** = baritone

**baryon** /ˈbarɪɒn/ *noun*

باریۆن، (فیزیک) پارچۆلکەی قورس: پارچۆلکەیێکی ژێرگەردیلەیی یان ژێرنەتۆمی subatomic particle بە بارستایی‌یێکی mass بەرامبەر بە یان گەورەتر لە پرۆتۆنێ، وەک nucleon یان hyperon ۞ باریون

**baryonic** *adjective*

سەربە باریۆن یان پارچۆلکەی قورس ۞ وابسته به باریون

**baryta** /bəˈrʌɪtə/ *noun*

(کیمیا) هایدرۆکسایدی باریۆم ۞ باریتا

**baryte** /ˈbarʌɪt, US ˈbɛː-/ *noun*, also barytes /bəˈrʌɪtiːz/, barite

بارایت، باریت: هایدرۆکسایدی باریۆم، جۆرێ کانی بێ‌رەنگ یان سپی، سولفاتی باریۆم پێکدێنێ ۞ باریت، بارایت

**basal** /ˈbeɪsl/ *adjective*

1 بنەرەتی، بنچینەیی، fundamental 2 بنی، بنکی، بنەکی: *basal cells of the skin* ◊ *basal leaves* ۞ 1 اساسی 2 وابسته به ته

**basal body** *noun*

ئەندامۆژەیێکی خانە شێلاق‌دار یا برژانگ‌دارەکان کە بنک یان بنەرەتی شێلاقە flagellum یا برژانگ cilium پێکدێنێ ۞ بادی باسال

**basal cell** *noun*

خانەی بنکی: هەر خانەیێ کە لە بنکی شانەیێکی فرەلۆ یان چەندتوێ multilayered هەڵکەوتووە ۞ سلول باسال

**basal cell carcinoma** *noun*, also rodent ulcer

(لووی) شێرپەنجەی خانەی بنکی: جۆرێ شێرپەنجەی ئاسایی پێست ب.ت. جۆری لەچارەسەرهاتووەکەی کە لە خانە بنکی‌یەکانی epithelium پەیدا دەبێ ۞ کارسینومای سلول باسال

**basal ganglion** *noun*

لوو یان گرێی بنکی: هەریەک لەو چەند کۆمەڵکە ماکە بۆرەی نێو توێکڵی مێشک کە لە مەهاری جووڵەدا ئەرکی هەیە ۞ غدەی باسال

**basal metabolic rate** *noun*

رێژەی مێتابۆلیزم یا مێتابۆلیکی بنەرەتی: ئەو رێژە وزەیەی کە لەش لە کاتی حەسانەوە یان پشوودا بۆ راگرتن یان بەردەوامی‌پێدانی کردە پێویستەکان بەکاری دێنێ وەک هەناسەکێشان و گەرمی راگرتن ۞ ریت متابولیک باسال

**basal metabolism** *noun*

مێتابۆلیزمی بنەرەتی: کەم‌ترین رێژەی وزە کە لەش لە کاتی پشوودا بۆ راگرتن یا بەردەوامی‌پێدانی کردە پێویستەکان بەکاری دێنێ وەک هەناسەکێشان، سووڕانی خوێن و گەرمی راگرتن ۞ متابولیسم باسال

**basalt** /ˈbæsɔːlt, US bəˈsɔːlt/ *noun*

باسۆلت، بازاڵت، رەشەمەرمەڕ، رەشەبەرد (بەردێکی گڕکانی کە پتر لە plagioclase لەگەڵ pyroxene و olivine پێکهاتووە) ۞ بازالت

**basaltic** /bəˈsɔːltɪk/ *adjective*

سەربە رەشەبەرد ۞ وابسته به بازالت

**bascule** /ˈbaskjuːl/ *noun*

قەپان، باسکۆل (بنەرەت: لە فەرەنسی‌یەوە بە واتای "seesaw") ۞ باسکول

**bascule bridge** *noun*

پردی قەپانی، پردی جووڵۆک ۞ پل متحرک

**base**[1] /beɪs/ *noun*, *pl.* bases

1 بنک، بن، خوارووی، بنکە، بێخ، بنج، بنچک، هیم، خیم، بنگە، پایە، بنەما، بنیات، بناخە، بنەرەت، بنواشە، بنەواشە، بنچینە: *the base of a column/glass* 2 بنکە 3 (کیمیا) تفت، باز، بەیس 4 کەرەسەی سەرەکی، مەتریاڵی بنەرەتی 5 (مێعماری) ژێرکۆڵ، بن کۆڵ، بنک 6 (دار) بن، کۆلکە 7 (زمانەوانی) قەد، بن، رەگ، ریشە (هی وشە یان دارشتەیێ)، فۆرم یان وشەی گەردان‌نەکراو 8 (بیرکاری) بنک 9 (بەیسبۆڵ) گۆشە (-based *adj*) ۞ 1 قاعده، ته، پایین، مبنا، بیخ، اساس، شالوده 2 پایگاه، مقر 3 باز 4 مادەی اصلی 5 تەستون 6 کنده 7 (زبان‌شناسی) ستاک، ریشە 8 (ریاضی) قاعده 9 گوش

**base**[2] /beɪs/ *adjective* (baser, basest)

سووک، نەگریس، جنێ‌شەرم، ناحەز، بێ‌شەرمانە ۞ فرومایه، قبیح

**baseball** /ˈbeɪsbɔːl/ *noun*

بەیسبۆڵ، گۆ یان تۆپی بەیسبۆڵ، بنکێن ۞ بیس‌بال، توپ بیس‌بال

**baseball cap** *noun*

کڵاو یان کاپی بەیسبۆڵ، شەپکەکەی peak درێژە ◌ کلاه یا کاپ بیس‌بال
**baseboard** /'beɪsbɔːd, US -bɔːrd/ = skirting board
**base-born** *adjective*
1 حەرامزادە، زۆڵ، بێژوو 2 سووک، خوێڕی ◌ 1 حرامزاده 2 رذل
**base jumping** *noun*, also BASE jumping
وەرزشی بازدان بە چەتر لە شوێنێکی بەرزەوە، بەرزەباز (وەکوو خانوو و پرد؛ base jumper *n*) ◌ پرش ارتفاع
**baseless** /'beɪsləs/ *adjective*
بێ‌بنچینە، بێ‌بنەما، درۆ، بێ‌بناخە، بێ‌بنیات، بێهوودە ◌ بی‌اساس، بیهوده
**baseline** /'beɪslaɪn/ *noun*
1 هێڵی بنکی، هێڵی سیفر، هێڵی دەسپێک، هێڵی بنەما 2 هێڵی کۆتایی یاریگا (تێنیس و هتد) ◌ 1 خط مبنا، معیار 2 خط پایانی زمین
**basely** /'beɪsli/ *adverb*
سووکانە، بە سووکایەتی‌یەوە، بە سووکی‌یەوە ◌ با فرومایگی
**basement** /'beɪsmənt/ *noun*
1 ژێرخان، ژێرزەوی، ژێرزەمین، ناوێس، وارنشین: 2 *a basement flat/apartment* (زەوی‌ناسی) کۆنترین پێکهاتی بەردەکان ◌ 1 زیرزمین 2 بیسمنت
**base metal** *noun*
کانزای نزم (= وەک ئاسن یا سورب کە وەک زێڕ بەنرخ نین) ◌ فلز پست
**baseness** *noun*
سووکی، چرووکی ◌ فرومایگی
**basenji** /bə'sendʒi/ *noun*
جۆرێ ڕەگەزی تاجی یا سەگی ڕاوی ناوەندی ئەفریکا ◌ باسنجی
**base rate** *noun*
نرخی سوودی بنەڕەت، نرخی بەهرەی بنەڕەت: *Bank base rates of 7 per cent are too high* ◌ نرخ بهره‌ی پایه
**bases** = plural form of base1 and basis
**bash** /bæʃ/ *noun*
1 گورز، لێدان، مشت 2 میوانی یان ئاهەنگێکی گەورە 3 (بریتانیا) حەوڵ، تێکۆشان ◌ 1 ضربه، مشت 2 پارتی یا جشن بزرگی 3 کوشش
**bashful** /'bæʃfl/ *adjective*
کەمڕوو، شەرمێون، فەدۆک، شەرمن، diffident ◌ خجالتی
**bashfully** /'bæʃfəli/ *adverb*
بە خەجاڵەتی‌یەوە، شەرمنانە: *she smiled bashfully* ◌ با خجالتی
**bashfulness** /'bæʃflnəs/ *noun*
حەیا، شەرم، ئابڕوو، فەدی، شەرمێونی، کەمڕوویی ◌ آزرم، حجب
**bashing** /'bæʃɪŋ/ *noun*
هێرش (توندوتیژانە ب.ت. دەستەیەکی تایبەتی) ◌ حمله
**Bashkir** /baʃ'kɪə/ *noun*
1 ئەندامی گەلێکی مسوڵمان، لە باشووری ئۆراڵ دەژین 2 زمانی Turkicی ئەو گەلە ◌ باشکر
**basho** /'baʃəʊ/ *noun, pl.* same or bashos
زنجیرەپێشبڕکێی زۆرانی sumo (ژاپۆنی، *ba* "شوێن" + *shō* "سەرکەوتن، بردنەوە") ◌ باشو
**basic** /'beɪsɪk/ *adjective, noun*
1 *adj* بنەڕەتی، بنچینەیی، سەرەکی، بنەمایی، بنجی، بنگەهی، پێویست، پێدڤی، سەرەتایی، دەسپێک، گرنگ، بەرکەفتی، سادە، (کیمیا) 2 *basic truth/fact* :fundamental تفتی، تایبەتمەندی تفتێکی تیایە، خاوەنی تایبەتمەندی تفتی، ئەلکالین 3 alkaline (زەوی‌ناسی) تا ڕادەیێ سیلیکای کەمە (یان کەم تیایە): 4 *basic rocks ,basic lava* (کانزاناسی) سەربە یان ئاماژە بە ڕەوتی پۆلاسازی کە ماکە پڕقسڵەکان دەگرێتەوە: 1 *n basic slag* بنەماکان، بنچینەکان، ڕاستەیە پێویست و گرنگەکان، سەرەتاکان 2 کەلوپەلە سەرەکی‌یان، کەلوپەلی سەرەکی ◌ *adj* 1 بنیادی، اصلی، ضروری، مهم، مقدماتی، ابتدایی 2 قلیایی، بازی 3 و 4 بیسیک *n* 1 مبانی. حقایق ضروری یا مهم 2 کالاهای اساسی
**BASIC** /'beɪsɪk/ *abbreviation* beginner's all-purpose symbolic instruction code
(کامپیوتێر) بێیسیک، هەروەها (Basic) زمانێکی بەرنامەنووسی سادەیە ◌ بیسیک
**basically** /'beɪsɪkli/ *adverb*
لە بنەڕەتدا، لە بنەڕەتا، لە ڕاستی‌دا: *basically correct* ◌ اساساً، در واقع
**Basic English** *noun*
ئینگلیسی بنەڕەتی (850 وشە، بۆ پێوەندی جیهانی) ◌ انگلیسی پایه
**basicity** /beɪ'sɪsɪti/ *noun*
(کیمیا) تفتێتی، توانایی تفتی ◌ قدرت بازی
**basic salt** *noun*
خوێی تفت، تفتەخوێ ◌ نمک بازی
**basic slag** *noun*
کوزەری تفتی (جۆرێ پەیینکە کە فۆسفاتی تیایە) ◌ سرباره‌ی قلیایی
**basic training** *noun*
ڕاهێنانی بنەڕەتی یان بنچینەیی (لە نێو هێزە چەکدارەکان‌دا) ◌ آموزش اساسی یا بنیادی
**basidia** = plural form or basidium
**basidial** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە basidiumـەوە هەیە ◌ وابسته به باسیدیوم

**basidiomycete** /bəˌsɪdɪə'mʌɪsiːt/ *noun, pl.* basidiomycetes /-'mʌɪsiːts, -mʌɪ'siːtiːz/
کۆمەڵێکی بەربڵاوی کارگەکان کە mushroom، puffball، rust و smut ـەکان دەگرێتەوە و لقی Basidiomycota پێکدێنن ◇ باسیدیومایسێت

**basidiospore** *noun*
توو یان سپۆری سەر بنکەڵە یان باسیدیۆم ◇ باسیدیواسپور

**basidium** /bə'sɪdɪəm/ *noun, pl.* basidia /-dɪə/
بنکەڵە، باسیدیۆم، بازیدیۆم: پێکهاتەیێکی سپۆرهەڵگری گۆپاڵئاسا یان گورزی وردبینی یان مایکرۆسکۆپی کە لە لایەن هێندێ کارگەوە بەرهەم دێ (بنەڕەت: لە *basidion* یۆنانییەوە، چکۆلێنراوی *basis*) ◇ باسیدیوم

**basification** *noun*
تفتاندن، بازیفیکاسیون ◇ قلیایی‌سازی

**basifixed** *adjective*
بنکپێکەوەنووساو، بنەڕەتپێکانووساو، نزیکەوەبوو لە بنەڕەت یان بنکەوە، پایەپێکالکاو، پایەگیر ◇ متصل در پایه

**basil** /'bæzl, US 'beɪzl/ *noun*
1 ڕیحان، ریحانە، ئەسپەرەم، لە خێزانی mint بۆ ئاشپەزیش بەکاردێنرێ [*Ocimum basilicum* (فرنجەمشک basil (sweet و جۆرەکانی تر] 2 (هەروەها wild basil) جۆرێ ڕووەکی ئەوروپایی وا، لەنێو دەوەنەلان و پەرژیندا شین دەبێ [*Clinopodium vulgare*] ◇ ریحان

**basilar** /'basɪlə/ *adjective,* also basilary
(توێکاری، گیانەوەرناسی) هەڵکەوتوو لە بن یان بنکی شتێ، ب.ت. کاسەسەر، بنەکی، بنەڕەتی ◇ واقع در پایین چیزی

**basilect** /'basɪlɛkt, US 'beɪsɪ-/ *noun*
(زمانەوانی) کەمبرەوترین زاراوە، ژێرەزاراوە ◇ باسیلکت

**basilectal** /'lɛkt(ə)l/ *adjective*
ژێرەزاراوەیی ◇ وابسته به باسیلکت

**Basilian** /bə'zɪlɪən/ *adjective, noun*
*adj* سەربە سەینت بازیلی گەورە St Basil the Great (دەوروبەری 79–330) و بیروباوەڕ و تیرەی ڕەبەنایەتی کە ئەو لە Cappadocia دایمەزراند *n* ڕەبەنی بازیلی ◇ باسیلین

**basilic** /'bəzɪlɪk/ *adjective*
سەربە بازیلیکا ◇ وابسته به بازیلیکا

**basilica** /bə'zɪlɪkə/ *noun, pl.* basilicas
بازیلیکا: 1 گەورە کڵێسە یان هۆڵێ لەگەڵ دوو ڕیز کۆڵەکە لەنێوەوە) 2 کۆشکێ پاتشایی 3 (لە ڕۆمی کۆندا) خانوویێکی لاکێشەیی oblong building دووڕیز ستوون، وەک دادگا و شوێنی کۆبوونەوەی گشتی بەکاردێنرا (basilican *adj*)
◇ 1 بازیلیکا 2 قصر سلطنتی 3 بازیلیکا

**basilisk** /'bæzɪlɪsk/ *noun*
1 بەزیلیسک (لە چیرۆکە کۆنەکاندا - گیانەوەرێکی مارئاسا کە دەتوانێ خەڵک بە چاولێکردن یان هەناسەهەڵکێشان بەسەریاندا، بکوژێ) 2 جۆرێ مارمێلکی درێژ و باریکی ئەمریکای ناوەندی [*Basiliscus plumifrons*] 3 - cockatrice (basiliscine or basiliscan *adj*) ◇ بازیلیسک

**basin** /'beɪsn/ *noun*
1 کاسە، لەگەن، تاس، تەشت، سوێنە، قاپشۆری، لانجین، تەسە (هی هەویر) 2 گۆلاو، پەنگاو، گۆلکاو، سەرچاوەکان، چاڵاو 3 چاڵێکی سەر ئاستی زەوی؛ ناوچەیێکی بەربڵاو کە چین و توێکانی سەر زەوی ڕووەو خاڵێ بە ناو خاڵی ناوەندی ڕۆچوون و چاڵێکیان بە شێوەی گومەزی ئاوەژوو پێکهێناوە (basinal *adj*؛ basined *adj*؛ basinlike *adj*) ◇ 1 کاسە، لگن 2 حوضە، آبگیر 3 باسن

**basinet** /'basɪnɪt/ *noun*
(مێژوویی) تاس‌کڵاوی سووکی لە پۆلا (یان پۆلایین) ◇ باسینت

**basipetal** /beɪ'sɪpɪt(ə)l/ *noun*
(ڕووەکناسی) بنکڕەو، بنڕەو، بنڕۆ، پایەخواز، بنخواز، ئاماژە بە هەڵدان یان گەشە (لە نووکەوە) بەرەو خوارێ (زۆرتر بەرامبەری acropetal؛ بنەڕەت: لە basis یۆنانی + *petere* لاتین "seck" + -al) ◇ باسیپتال

**basipetally** /beɪ'sɪpɪt(ə)li/ *adverb*
بنکڕەوانە، بنڕەوانە، بنڕۆیانە، پایەخوازانە، بنخوازانە ◇ به طور باسیپتال

**basis** /'beɪsɪs/ *noun, pl.* bases /-siːz/
1 بناخە، بنەڕەت، بنگەهـ پایە، بنچینە، بنەما: *Some movies have been banned on the basis that they are too violent* ◊ *on a regular/permanent/part-time/temporary basis* ◊ *The theory seems to have no basis in fact* 2 کەرەسەی سەرەکی، مادەی بنەڕەتی، ماکی سەرەکی ◇ 1 پایە، شالود، بنیاد، مبنا 2 مادەی اصلی

**basis point** *noun*
(دارایی) خاڵی بنەڕت یان بنەما (سەدیەکی یەک لە سەد) ◇ نقطەی پایە

**basket** /'bɑːskit, US 'bæs-/ *noun*
1 گۆشەر، قرتاڵە، سەبەتە، تووڵێنە، تریان، سەوە: *a shopping basket* 2 سەوەیێ، قرتاڵەیێ: *a basket of fruit* 3 (بەسکێتبۆڵ) ئاڵقە یان بازنە ◇ 1 سبد، زنبیل 2 مقدار گنجایش زنبیل 3 حلقه (بسکبال)

**basketball** /'bɑːskɪtbɔːl, US 'bæs-/ *noun*
تۆپی سەبەتە، باسکە، ئەو تۆپەی کەوا لەو

یاری‌یەدا کایەی پێ‌دەکەن ۞ بسکتبال، توپ بسکتبال

**basket case** *noun*

(نافەرمی) ولات یان ڕێکخراوەیێ کە ڕەوشی ئابووری‌یەکەی یەکجار خراپ یان شپرزەیە: *an economic basket case* ۞ باسکت کیس

**basketful** *noun, pl.* basketfuls

(پڕ)قرتالەیێ یان سەوەتەیێ، قرتالەبەرێ ۞ بە اندازەی یک زنبیل

**Basket Maker** *noun*

ئەندامی چاندیکی باشووری ڕۆژاوای ئەمریکا، کە قۆناخە سەرەتاکانی فەرهەنگی Anasazi یان پێکهێنا ۞ باسکت میکر

**basketweave** *noun*

چنینی سەوەتەیی یا حەسیری، سەوەتەچن، حەسیرچن ۞ بافت سبدی

**basketwork** /'bɑ:skɪtwɜ:k, US 'bæskɪtwɜ:rk/ *noun*, also basketry

1 سەوەتەچنی، حەسیرچنی، گۆشەرچنی 2 کوتاڵ یان پارچەی حەسیرچن ۞ 1 سبدبافی 2 پارچەی حصیربافت

**basmati** /bas'mɑ:ti, US -z-/ *noun*, also basmati rice

(هیندی) برنجی بۆنخۆش یان باسمەتی ۞ برنج باسمتی

**bas mitzvah** /ˌbæs 'mɪtsvə/ = bat mitzvah

**basophil** /'beɪsə(ʊ)fɪl/ *noun*

(کارئەندامناسی) خڕۆکەسپی تفت‌دۆست یان باسوفیلیک، ماک یان مەتریالی تفت‌دۆست ۞ باسفیل

**basophilic** /ˌbeɪsə(ʊ)'fɪlɪk/ *adjective*

(کارئەندامناسی، خانەیێ یان نێوەڕۆکەکەی) زوو ڕەنگێنراوە بە ڕەنگی تفتی یان قلیایی basic، تفت‌دۆست ۞ باسفیلیک

**Basotho** /bə'su:tu:/ *noun, pl. sing.* Mosotho

گەلی sothoی باشووری بە گشتی، زۆرتر لە Lesotho دەژین ۞ باسوتو

**basque** /bɑ:sk, US bæsk/ *noun*

باسک (جۆرێ جلی بنەوەی ژنانەیە) ۞ باسک

**Basque** /bɑ:sk, US bæsk/ *noun*

1 باسک (ئەندامی گەلێ کە لە پیرێنیس Pyreneesی ڕۆژاوا هەم لە فەڕەنسە و هەم سپانیا دەژین 2 زمانی ئەو گەلە، وادیارە پێوەندی بە هیچ زمانێکی ترەوە نەبێ) ۞ باسک

**bas-relief** /ˌbæs rɪ'li:f/ *noun*

(هونەر) بەرزەکۆڵی، بەرجەستەکاری، باس‌ریلیف، کۆڵین‌گەری، نموونەی ئەم کارە ۞ برجستەکاری، نقش برجستە

**bass**[1] /beɪs/ *adjective, noun*

1 باس، گڕ، بەم، بۆڕ 2 گۆرانی‌بێژی ئەو دەنگە 3 دەنگی گڕ یان باس 4 ئامێری گڕدەنگ ۞ 1 بم، باس 2 خوانندەی باس 3 صدای باس 4 ساز باس

**bass**[2] /bæs/ *noun, pl.* same or basses

ماسی دڕکاوی، ماسی‌یەدڕکە، گورگی دەریایی(خۆراکی [*Dicentrarchus labrax* (دەریاکانی ئەورووپا) و جۆرەکانی تر]، هەروەها بڕوانە sea bass) ۞ باس

**bass**[3] = bast

**bass clef** *noun*

(موسیقا) کلیلی فا یان باس ۞ کلید فا

**basset** /'bæsɪt/ *noun*, also basset hound

تانجی، تاجی، تازی (بە گوێ و قەدی درێژەوە) ۞ باست

**bass fiddle** *noun*

چەلۆ یان ڤیۆلێنسێلی گەورە ۞ ویولنسل بزرگ

**bass guitar** *noun*

گیتارباس یان گڕگیتار، گیتارگڕ، بەم‌گیتار (بە نۆتە نزمەکان لێدەدرێ) ۞ گیتارباس

**bassinet** /ˌbæsɪ'net/ *noun*

1 لانکەی قرتالەیی (تەختەخەوی منال لە قرتالە دەچێ)، لانکەی سەوەتەیی یان حەسیری 2 لەگەنچە، تاسولکە ۞ 1 باسینت 2 لگنچە

**bassist** /'beɪsɪst/ *noun*

گیتارباس‌ژەن، کەسێ کە باس‌گیتار یان دەبڵ‌گیتار لێدەدا ۞ باسیست

**basso** /'basəʊ/ *noun, pl.* bassos or bassi /-si/

گۆرانی‌بێژی گڕدەنگ ۞ خوانندەی باس

**bassoon** /bə'su:n/ *noun*

باسوون، بەسوون (= جۆرێ ساز و ئامێری فوویی یان بایی دارینی زەردی گەورەی موسیقایی‌یە، لە خێزانی oboe) ۞ باسون

**bassoonist** /bə'su:nɪst/ *noun*

بەسوون‌ژەن ۞ نوازندەی باسون

**basso-relievo** /ˌbasəʊrɪ'li:vəʊ/ = bas-relief

**bass viol** = 1 viola da gamba 2 double-bass

**basswood** /'baswʊd/ *noun*

درەختی زیروفونی ئەمریکایی، دارەکەی [*Tilia americana*] ۞ باسود

**bast** /bast/ = bast fibre

**bastard** /'bɑ:stəd, 'bæs-, US 'bæstərd/ *noun, adjective*

*n* 1 (منداڵ) زۆڵ یا حەرامزادە 2 (نافەرمی) مرۆڤی زۆڵ *adj* 1 حەرامزا، بیژوو، بیژی، بیچ، زۆڵزادە، ناڕەوا؛ دوڕڕە 2 تێکەڵ، ناڕەسەن 3 ساختە، درۆ، درۆزنە، قەڵب 4 قەحبەدایک، دایک‌کوونی، دایک‌جندە 5 خاوەنی شێوە یان بارستەیەکی نائاسایی، نالەبار، بەدقەوارە ۞ *n* 1 بچەی حرام‌زادە 2 آدم نفرت‌انگیز *adj* 1 حرام‌زادە، نامشروع؛ دورگە 2 آمیختە 3 کاذب 4 مادرقحبە 5 دارای شکل یا حجم غیرمتعارف

**bastardization** *noun*

1 زۆڵ‌خستنەوە، بیژووخستنەوە 2 شێواندن، دەستکاری، لەبایەخ‌خستن، لەباوەڕخستن، بێ‌باوەڕکردن، لەبڕەوخستن ◌ 1 باستردیزاسیون 2 تحریف، بی‌اعتبارسازی

**bastard wing** *noun*

باڵۆچکە، پەڕۆچکە، دەستەیێ لە شاپەڕی چکۆلانەی سەر یەکەمین پەنجەی باڵی باڵندەیێ ◌ باستارد وینگ

**bastardy** /'bɑ:stədɪ/ *noun, pl.* bastardies

زۆڵی، بیژوویی، پیچی، illegitimacy ◌ حرامزادگی

**bast fibre** *noun*

ریشاڵی دار (بۆ بەستن و چنینی حەسیر و سەبەتە) ◌ الیاف درختی

**bastide** /ba'sti:d/ *noun*

دێ یا شارۆچکەیێکی شووره‌داری باشووری فەرەنسە ◌ باستید

**bastille** /bæs'ti:l/ *noun*

1 قەڵای شووره‌دار 2 زیندان، بەندیخانە، گرتنگا، prison، jail ◌ 1 باستیل 2 زندان

**Bastille Day** *noun*

ڕۆژی باستیل: چاردەیەمی ژووڵای وەک ڕۆژێکی پشووی نەتەوەیی لە فەرەنسە بە یادی ڕووخانی باستیل لە 1789 ◌ روز باستیل

**bastinado** /ˌbastɪ'neɪdəʊ, US -'nɑ:dəʊ/ *noun,* also bastinade, *pl.* bastinados or bastinadoes

(مێژوویی) فەلاقە، فەراقە (بنەڕەت: لە *bastum* "stick" late Latin) ◌ چوب فلک

**bastion** /'bæstiən/ *noun*

1 قەڵای باستیێن، شوورەی دووپاڵوو 2 پارێزە، پەنا، بەرگریگا، قەڵای لەگرتن‌نەهاتوو ◌ 1 دژ باستیان 2 حفاظ، پناه

**bat**[1] /bæt/ *noun*

1 لێدەردەسک، دەسکی لێدان، ڕاکێت، (پینگ پۆنگ) 2 پیاکێشان، لێدان (سەخت) 3 دار 4 خشت 5 قوڕی خۆش‌کراو بۆ دروست‌کردنی جەرە، گۆزە و هتد 6 ڕێژەی خێرایی 7 گۆچان، شەک ◌ 1 راکت 2 ضربه 3 چوب 4 خشت 5 بات 6 نسبت سرعت 7 چوگان

**bat**[2] /bæt/ *noun*

1 شەمشەمەکوێرە، پرچەمێک، چەکچەکی، چێلەمێ، شەقرەقێک، شەفکۆر، شەمەلە(کۆرە) [دەستە Chiroptera: زۆر جۆرن] 2 (نافەرمی، هەروەها old bat) ژنی خوێنتاڵ و ناشیرین ◌ 1 خفاش 2 زن غیرجذاب

**Batak** /'batək/ *noun, pl.* same or Bataks

1 باتەک: ئەندامی گەلێکی بەشی باکووری سوماترا و ئیندۆنیزیا 2 زمانی ئیندۆنیزیایی ئەو گەلە ◌ باتک

**Batavian** *noun, adjective*

(کۆن) *n* ئەندامی گەلی کۆنی ئەڵمانی، دانیشتووی دوورگەی Betuwe بوون و ئێستا لە بەشێکی هولەند دەژین *adj* 1 سەربەو گەلە 2 سەربەوانەی کە لە هولەندن 3 سەربە Djakarta لە ئیندۆنیزیا ◌ باتاوی، باتاوین

**batch** /bætʃ/ *noun*

1 تەنووری، چێن، دەستەوار، بەر، بەرهەمی یەکجار لێ‌نیشتن (نان، کەیک و هتد)، بەرەڵێ‌نیشتن 2 تیپ، کۆمەڵ، دەستە، گرووپە 3 ئەو برە دەرمان یان خۆراکەی کەوا لە کاتێک‌دا بەرهەم هاتووە 4 کۆمەڵێ لەو کارانەی کە پێکەوە لەسەر کامپیوتێر پراسێس کراون (یان لێکەوەدراون): *a batch file/program* ◌ 1 یک پخت 2 گروه، دسته 3 و 4 باچ

**batch processing** *noun*

(کامپیوتێر) لێکدانەوەی دەستەیی، پراسێسینگی یەکجێ ◌ پردازش دسته‌ای

**batch production** *noun*

بەرهەمهێنانی دەستەیی ◌ تولید مواد به صورت دسته

**bat-eared fox** *noun*

(گیانەوەرناسی) ڕێوی گوێ‌شەمشەمەکوێرەیی یان گوێ‌چەکچەکی [*Otocyon megalotis*] ◌ نوعی روباه

**bateau** /'batəʊ/ *noun, pl.* bateaux /-əʊz/

جۆرێ بەلەمی چۆمی سووکی بن‌تەختی کەنەدایی ◌ باتو

**bated** /'beɪtɪd/ *adjective,* with bated breath

لە ئەوپەڕی نیگەرانی‌دا (یان ورووژاوی‌دا)، لە دڵەکوتێ‌دا ◌ احساس نگرانی یا هیجان‌زدگی شدید

**bateleur eagle** /'bat(ə)lə:/ *noun*

هەڵۆجامبازە: هەڵۆی کلک‌کوڵی ئەفریکایی زۆرتر پەڕباڵ ڕەش [*Terathopius ecaudatus*] ◌ نوعی عقاب

**Bates method** *noun*

شێوازی باتێس: شێوەیێ بۆ باش‌ترکردنی بینایی چاو بە ڕاهێنان و مەشقی چاو ◌ روش باتس

**batfish** *noun, pl.* same or batfishes

1 ماسی‌یەچەکچەکی، شەمشەمەماسی [خێزانی Ogcocephalidae: زۆر جۆرن] 2 جۆرێ ماسی ناوچەی هێند و پاسیفیک، لە angelfish دەچێ [تۆخم *Platax*] ◌ بات‌فیش

**bath(o)-** *prefix*

پێشگر: قووڵایی، قووڵی (بنەڕەت: لە *bathos* یۆنانی) ◌ پیشوند: ژرفا

**bath**[1] /bɑ:θ, US bæθ/ *noun, pl.* baths

1 خۆشتن، مەلێ(کردن) 2 گەرماو، حەمام 3 دووش، گەرماوی فەرەنگی، حەوزی خۆشتن 4 شەلەی شتن 5 (baths) تەستیر (ی سەرداپۆشراو)، گەرماوی گشتی (سەرشۆ -bath attendant) ◌ 1 استحمام 2 حمام 3 دوش، وان

4 مایع شستشو 5 (در جمع) استخر، حمام عمومی
**bath²** /bɑ:θ, US bæθ/ *noun*
پێوەرێکی کۆنی شلە لای عیبرییانی زوو، دەوروبەری 40 لیتر یان 9 گالۆن (دەگرێ؛ بنەڕەت: لە *bat* عیبرییەوە) ◌ بات
**bath-chair** *noun*
کورسی پێچکەدار یان چەرخدار ◌ صندلی چرخدار
**bathe** /beɪð/ *noun*
خۆشتن، مەلێ، سۆبایی ◌ شنا، آبتنی
**bathed** /beɪðd/ *adjective*, bathed in *or* with
نوقمی، خووساو، تەڕ (لەناو ئارەقە یان فرمێسکدا) ◌ غرق، خیس
**bather** /'beɪðə(r)/ *noun*
مەلێکەر، خۆشۆر (لە دەریا، رووبار و هتد) ◌ آبتنی‌کننده
**bathetic** /bə'θɛtɪk/ *adjective*
1 سەربە قوولی یان قوولایی 2 نزم، نەوی ◌ 1 وابسته به عمق 2 پست
**bath-furnace** *noun*
دۆزەخ، جەهەنم، کوورە یا تەنوونی گەرماو، ئاگرخانە ◌ جهنم، تون حمام
**bathhouse** /'bɑ:θhaʊs, US 'bæθ-/ *noun*
گەرما و یان حەمامی گشتی ◌ حمام عمومی
**bathing** /'beɪðɪŋ/ *noun*
خۆشتن، مەلێ، مەلە ◌ آبتنی
**bathing cap** = swimming cap
**bathing costume** = swimming costume
**bathing suit** = swimming costume
**bathing trunks** = swimming trunks
**bathmat** *noun*
رایەخی حەمام یان گەرماو، جێری گەرماو (کە ناخزێ) ◌ باتمات
**bathometer** *noun*
قوولپێو، قوولاییپێو ◌ ژرفاسنج
**bathos** /'beɪθɒs, US -θɑ:s/ *noun*
لێژبوونەوە، داخزان، داکەوتن، داشکان، ئەنتیکلیماکس anticlimax (ب.ت. لە وێژەدا؛ بنەڕەت: لە یۆنانییەوە بە واتای "قوولایی") ◌ افت، نزول
**bathosic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە bathos ـەوە هەیە ◌ وابسته به افت یا نزول
**bathrobe** /'bɑ:θrəʊb, US 'bæθroʊb/ *noun*
بەرگی حەمام، خاولەی کڵاودار یان بەری ◌ حوله‌ی پالتویی
**bathroom** /'bɑ:θru:m, -rʊm, US 'bæθ-/ *noun*
حەمام، گەرماو، دەسبەئاو، ئاوەدەسخانە ◌ حمام، مستراح
**bath salts** *noun, pl.*
خوێی گەرماو، بۆ بۆنخۆشکردن و نەرمکردنەوەی ئاو (ئاوێتەیێکی کریستاڵی زۆرتر رەنگین) ◌ نمک حمام
**bath-towel** *noun*
خاولەی گەرماو یان حەمام ◌ حوله‌ی حمام
**bathtub** /'bɑ:θtʌb, US bæθ-/ *noun*
حەوزی خۆشتن، وان ◌ وان
**bathy-** /'baθi/ *prefix*
پێشگر: قوولی، قوولایی، وەک *bathysphere* (بنەڕەت: لە *bathus* یۆنانییەوە "deep") ◌ پیشوند: ژرفا، ژرفایی
**bathyal** /'baθɪəl/ = deep-sea
**bathymeter** /bə'θɪmɪtə/ *noun*
قوولاییپێو، قوولپێو: ئامێرێ بۆ پێوانی قوولایی ئاو ◌ ژرفاسنج
**bathymetric** *adjective*, also bathymetrical
سەربە قوولاییپێوی ◌ وابسته به ژرفاسنجی
**bathymetry** *noun*
قوولاییپێوی، قوولپێوی ◌ ژرفاسنجی
**bathypelagic** /ˌbaθɪpɪ'ladʒɪk/ *adjective*
قوولاییژی (= ئەو ماسی و زیندەوەرانی کە لە مەودای نێوان 1000 تا 3000 میتر دەژین، کە سارد و تاریکە) ◌ باتیپلاجیک
**bathyscaphe** /'baθɪskaf/ *noun*, also bathyscaph
(مێژوویی) قوولاییگەڕ، کەشتی قوولایی، قوولاییڕەو، قوولاییڕۆ ◌ ژرفناپیما
**bathysphere** /'bæθɪsfɪə(r), US -sfɪr/ *noun*
1 دەزگا یان ئامێرێکی گۆیی spherical مەلەوانییە، بۆ لێکۆڵینەوەی ژیانی قوولایی دەریا بەکاردێنرێ، بەهۆی کابلێکەوە بۆ قوولاییەکانی ئۆقیانووس شۆڕ دەکرێتەوە 2 (زەویناسی) باسیسفێر، چینەقوولینە: ئەو بەشەی زەوی کە لەژێر توێکڵی دەرەوەی (زەوی) هەڵکەوتووە. پێکهاتە و سروشتی ئەو بەشە لە زەوییەوە تا ئێستا بە دروستی نەناسراوە، بەڵام ئەوە مسۆگەرە کە ئەم بەشە تەواو چڕ و پڕە و لەوە دەچێ گەرما و تینێکی زۆری بێ ◌ 1 باتیسفر 2 سنگین‌کره
**batik** /bə'ti:k/ *noun*
چاپی مێوی، شێوازی رەنگاندنی نموونەکانی پارچە بە مۆم یان مەتریاڵی وشکەوەبووی ئەو مۆمە (لە جاڤاییەوە) ◌ باتیک
**bating** *preposition*
بێجگەلە، جگە، ژبلی، بەدەرلە، excepting ◌ به استثنای
**batiste** /bə'ti:st/ *noun*
(لە فەرەنسییەوە) پارچەیەکی کەتانی و ڕێڕێی ناسک، شێوەی cambric دەدا ◌ باتیست
**batman** /'bætmən/ *noun, pl.* batmen

**belemnite** /ˈbɛləmnʌɪt/ *noun*
جۆرێ لەشنەرمی پێسەری cephalopod دەریایی قرتێکەوتوو (دەستە Belemnoidea)، بووبەردی نیشتووەکانی سەردەمانی ژوراسیک و کریتاسە Cretaceous ◌ بلمنایت

**belfry** /ˈbɛlfri/ *noun, pl.* belfries
قوللە یان برجی زەنگ، کەلوو یان تاوێری زەنگ، زەنگخانە ◌ برج ناقوس

**Belgae** /ˈbɛldʒiː, US ˈbɛlgʌɪ/ *noun, pl.*
گەلێکی سێلتی کۆن، دانیشتووی گۆل و رووبارەکانی Marne ◌ بلجا

**Belgian** /ˈbɛldʒən/ *adjective, noun*
*adj* بێلژیکی *n* 1 خەڵکی بێلژیک، دانیشتووی بێلژیک Belgium 2 نەسەبی بێلژیکی ◌ *adj* بلژیکی *n* 1 اهل بلژیک 2 اسب بلژیکی

**Belgian hare** *noun*
کەرویشکی بێلژیکی ◌ خرگوش بلژیکی

**Belgian Malinois** *noun, pl.* same, also Malinois
جۆرێ نژادی سەگ سەربە Belgian sheepdog ◌ نوعی سگ

**Belgian sheepdog** *noun*
سەگی شوانی بێلژیکی ◌ سگ گلەی بلژیکی

**Belgian Tervuren** *noun*
جۆرێ نژادی سەگ سەربە Belgian sheepdog ◌ نوعی سگ

**Belgic** /ˈbɛldʒɪk/ *adjective*
سەربە Belgae ◌ وابستە بە Belgae

**Belial** /ˈbiːlɪəl/ *noun*
شەیتان (بنەڕەت: لە *bēliyya'al* عیبری‌یەوە) ◌ شیطان

**belief** /bɪˈliːf/ *noun*
1 باوەڕ، بەقا، بڕوا، ئیمان، دڵنیایی، ڕاپەڕموون، متمانە، لێ‌تێڕادیتن: *belief in God/democracy* 2 بۆچوون، ڕا، بینین، نێرین، گومان، بیر، هزر: *There is a general belief that things will soon get better* 3 (beliefs) بیروباوەڕ: *A society should be judged on its beliefs and values. religious/political beliefs* ◌ 1 اعتقاد، ایمان، اطمینان، اعتماد 2 تصور، عقیده 3 (در جمع) اعتقادات

**believability** /bɪˌliːvəˈbɪlətɪ/ *noun*
پەسندکراوی، جێی‌باوەڕێتی، باوەڕپێکراوی، باوەڕمەندی، لێ‌ڕاپێنراوی، جێی متمانەبوون ◌ قابلیت قبول، قابلیت اعتماد

**believable** /bɪˈliːvəbl/ *adjective*
پەسندکراو، جێی‌باوەڕ، باوەڕپێکراو، باوەڕمەند، لێ‌ڕاپێنراو، جێی متمانە، plausible: *a play with believable characters* (دژەکەی unbelievable) ◌ قابل قبول، قابل اعتماد

**believer** /bɪˈliːvə(r)/ *noun*
1 بەبڕوا، بەئیمان، بەباوەڕ، باوەڕمەند، باوەڕدار، بڕوامەند 2 لایەنگر، تالیگر ◌ 1 مؤمن، معتقد 2 طرفدار

**Belisha beacon** /bəˌliːʃə ˈbiːkən/ *noun*
چرای زەردی هەڵبووکوژاوە (لە بریتانیا، شوێنی پەڕینەوە لە ڕێگا؛ بنەڕەت: لە ناوی Leslie Hore-*Belisha*، وەزیری گواستنەوە) ◌ چراغ زرد چشمک‌زن

**belittlement** *noun*
چکۆلەکردنەوە، بچووکاندن، بەکەم‌گرتن، بەهێند دانەنان، سووکی‌پێ‌کردن، سووکایەتی (belittler *n*) ◌ کوچک‌سازی، تحقیر

**belittling** *adjective*
سووکایەتی‌یانە، سووکانە ◌ اهانت‌آمیز

**belittlingly** *adverb*
بە شێوەیێکی سووکانە ◌ بە طور اهانت‌آمیز

**Belizean** /bɛˈliːzɪən/ *noun, adjective,* also Belizian
*n* خەڵکی Belize، ولاتێ لە کەناری کاریبیەن یان کارائیبی ئەمریکای ناوەندی *adj* سەربە بێلیز ◌ بلیزین

**bell**[1] /bel/ *noun*
1 زەنگ، گەرنال، زلزەنگ، زام، جام 2 دەنگەدەنگ، دەنگی زەنگ، زرە، زەنگوڵە 3 تۆپەگوڵ، کاسەگوڵ 4 هەر شتێکی زەنگ‌ئاسا ◌ 1 زنگ، زنگولە، ناقوس 2 صدای زنگ 3 جام گل 4 هرچیز زنگ‌مانند

**bell**[2] /bel/ *noun*
مرقە، دەنگی گاکێوی لە سەروبەندی جووت‌بووندا ◌ بل

**belladonna** /ˌbɛləˈdɒnə, US -ˈdɑːnə/ *noun*
1 (ڕووەکناسی) هەنگوورەتالە، (گیا)تەماتەمارانە [*Atropa belladonna*] 2 دەرمانی هەنگوورەتالە ◌ 1 شابیزک 2 داروی بلاڈن

**bellbird** *noun*
1 باڵندەی زەنگی؟: جۆرێ باڵندەی گەرمێنانی ئەمریکا، لە تیرەی cotinga [تۆخم *Procnias*] 2 باڵندەیێکی دەنگ‌خۆشی ئەوسترالیایی (نیوزیلەند) [*Anthornis melanura*] و جۆرەکانی تر ◌ بل‌برد

**bell-bottomed** *adjective*
دەلنگ‌هەراو، دەرەقوڵفش، دەلینگ‌فش (شەڵوار) ◌ پاچەگشاد

**bell-bottoms** *noun, pl.*
شەڵواری دەلینگ‌هەراو ◌ شلوار پاچەگشاد

**bellboy** /ˈbelbɔɪ/ = pageboy

**bell-buoy** *noun*
(دەریاوانی) زەنگی سەراوکەوتە، تۆپە یان سەراوکەوتەی زەنگدار ◌ گویەی زنگ‌دار

**bell captain** *noun*
سەربەردەست، گەورەی بەردەستەکانی هوتێل

⬡ سرپیشخدمت

**belle** /bel/ *noun*
شاجوان، ژنی هەرەجوان، موترفە، پەریئاسا ⬡ خوبروی، پریروی

**Belleek** *noun*
بێلیک: جۆرێ چینی زۆر روون و ناسک بە لوعابی بریقەدار (بنەڕەت: *Belleek*: ناوی شارێکی ئیرلەندی باکووری) ⬡ بلیک

**belle époque** /ˌbel eɪˈpɒk, French bɛl epɔk/ *noun*
(فەرەنسی) ماوە یان سەردەمی ئاسایشت، سەردەمی سەقامگیری، بەرلە شەڕی جیهانی یەکەم (بنەڕەت: واتای خۆی: ماوەی خۆش) ⬡ دورەی ثبات

**Bellerophon** *noun*, Latin, from Greek *Bellerophēn*
بێلێرۆفۆن: ناوی پاڵەوانێکی یونانی کە Chimeraی کوشت ⬡ بلروفون

**belles-lettres** /belˈletr(ə), French bɛllɛtʀ/ *noun, pl.*
(فەرەنسی) ویژە، تۆرە، ئەدەبیات ( belletrism (/belˈletrɪz(ə)m/ *n* ⬡ ادبیات

**belletrist** *noun*, also belle-lettrist
(فەرەنسی) ویژەوان، تۆرەڤان، نووسەری بەرهەمی ویژەیی (belletristic *adj*) ⬡ ادیب

**bell-flower** *noun*
(رووەکناسی) گوڵەپیاڵە، گوڵەزەنگی [توخم *Campanula*: زۆر جۆرن] ⬡ گل استکانی

**bellhop** /ˈbelhɒp, US -hɑːp/ = pageboy

**bellicose** /ˈbelɪkəʊs, -kəʊz, US -koʊs, -koʊz/ *adjective*
شەڕخواز، شەڕەنگێز، شەڕانی، شەڕخوازانە، شەڕەنگێزانە، دوژمنکارانە، aggressive، warlike ⬡ ستیزەجو، جنگطلب، جنگطلبانە

**bellicosity** /ˌbelɪˈkɒsəti, US -ˈkɑːs-/ *noun*, also bellicoseness
شەڕخوازی، شەڕەنگێزی، بەشەڕهاتوویی ⬡ ستیزەجویی، جنگطلبی

**belligerence** /-əns/ *noun*, also belligerency
دوژمنایەتی، شەڕخوازی، شەڕەنگێزی، شەڕفرۆشی، پیاهەڵپڕژان ⬡ خصومت، ستیزەجویی

**belligerent** /bəˈlɪdʒərənt/ *adjective, noun*
*adj* شەڕخواز، دوژمنانە، دوژمنکارانە، لەشەڕدا، لە دۆخی شەڕدا، شەڕبەدەست: *the belligerent countries/states/nations* *n* 1 ولاتی لە کاتی شەڕدا، ولاتی بەشەڕهاتوو 2 شەڕکەر ⬡ *adj* ستیزەجویانە، جنگطلب، خصمانە، متخاصم *n* 1 دولت متحارب 2 رزمندە

**belligerently** /bəˈlɪdʒərəntli/ *adverb*
شەڕخوازانە، دوژمنانە، دوژمنکارانە ⬡ خصمانە

**Bellini** /bəˈliːni/ *noun, pl.* Bellinis
جۆرێ کوکتایل یان کوکتێل، ناوی کۆخ لەگەڵ شامپاین لێکدەدرێ (بنەڕەت: لە ناوی وێنەکێشی ڤێنیزی Giovanni *Bellini* (دەوروبەری 1430–1516)، ویدەچێ ئەم کوکتێلە لە ڤێنیز داهێنرابێ) ⬡ بلینی

**bell jar** *noun*
زەنگی شووشەیی ⬡ ناقوس شیشەای

**bellman** /ˈbəlmən/ *noun, pl.* bellmen
زەنگژەن، جارچی ⬡ ناقوسنواز، جارچی

**bell metal** *noun*
کانزای زەنگەکان ⬡ فلز زنگها

**bell-mouthed** /ˈbell maʊðd, US -maʊθt/ *adjective*
دەمزل، دەمگاوس، دەمزەنگ، دەمکراوە ⬡ دهنگشاد

**Bellona** *noun*, Latin
بێلونا (خودای شەڕ، لە میسۆلۆژی رۆمیدا) ⬡ بلونا

**bellow** /ˈbeləʊ/ *noun*
نەڕە، گوڕە، بۆڕە: *to let out a bellow of rage/pain* ⬡ نعرە، ماغ

**bellows** /ˈbeləʊz, US -loʊz/ *noun, pl.*
1 دەمە، مووشەدەمە، نەپاخ (= ئاسنگەری و موسیقا)، کوورک (= مووشەدەمەی مسگەران): 2 *a pair of bellows* (لە وێنەگریدا) بیلۆز (بنەڕەت: لە *bely* ئینگلیسی نێوەڕاست "bellows"، لە *belg* ئینگلیسی کۆن "توورەکە، کیسە، bag، پێستە"، نزیک بە *balg* زمانی ئەڵمانی باشووری Old High German "bag"، لە *blāwan* ئینگلیسی کۆن "فووپیاکردن، فووتێکردن") ⬡ 1 دم 2 فانوس

**bell-push** *noun*
دوگمە یان داگرەی زەنگ ⬡ شستی زنگ

**bell-ringer** *noun*
زەنگژەن لە کلێسەدا ⬡ ناقوسزن کلیسا

**bell-ringing** *noun*
زەنگژەنی کلێسەدا ⬡ نواختن ناقوس کلیسا

**bells** *noun, pl.*
زەنگ (ئامێری موسیقا) ⬡ ناقوس

**bells and whistles** *noun, pl.*
تایبەتمەندییە سەرنجڕاکێشەکان، سەنگ‌وڕەنگ ⬡ ویژگیهای جذاب

**Bell's palsy** *noun*
شەپلە یان لەسمی بێل: شەپلەی دەمارێکی روو، لەبەر لاوازی ماسوولکە کە لاری لایەکی دەم‌وچاوی لێدەکەوێتەوە (بنەڕەت: لە ناوی توێکاری سکاتلەندی Sir Charles *Bell* کە یەکەجار لەی دوا) ⬡ فلج بل

**bell-tent** *noun*
خێوەت یان رەشماڵی ئەستووندەکدار، چادری چەلاکڕێژ یان چەلاکدار ⬡ خیمەی دیرکدار

**bellwether** *noun*
1 بەرانی پێشەنگ، مەڕی زەنگولەلەمل یان زەنگولەدار، سەرجەلە، پێشەنگ (زۆرتر زەنگولەی لە ملا بێ) 2 سەردەستە، پێشەنگ، ڕێبەر، سەرۆک، پێشەوا: *University campuses are often the bellwether of change* ◌ 1 پیش‌آهنگ 2 رهبر، سردسته

**belly** /'beli/ *noun, pl.* bellies
1 زگ، سگ، لەم، ورگ، کرش، عوور، ئەشک، ئاشک، لەمە، تورک 2 (لە فڕۆکە و کەشتی‌دا) زگ 3 (کۆن) منداڵدان، پزدان 4 (لە ئامێری موسیقادا) کاسە ◌ 1 شکم 2 (در هواپیما و کشتی) شکم 3 رحم 4 کاسه

**bellyache** /'belieɪk/ *noun*
1 ژانەسگ، دڵەکزێ، دڵێشە 2 سکاڵا، بۆڵەبۆڵ، پرتەوبۆڵە، خوتەخوت ◌ 1 دل‌درد 2 غرولند

**belly-band** /'belieɪk/ *noun*
کەزوو، تەنگ ◌ تنگ

**belly-button** = navel

**belly dance** *noun*
سەمای زگ، سەما یان ڕەخسی عەرەبی (بە زگ و بادانی سمت) ◌ رقص شکم، رقص عربی

**belly dancer** *noun*
سەماکەر یان دانسێری زگ، ڕەخسکێشی عەرەبی ◌ رقاص شکم

**bellyflop** /'beliflɒp, US -flɑːp/ *noun*
(نافەرمی) بە زگەوە خۆ بە ئاوادان، لوولبوون بە زگەوە ◌ شیرجه با شکم

**bellyful** /'belifʊl/ *noun, pl.* bellyfuls
بە ڕادەی پێویست، سەروزیاد، بڕێکی زۆر، لە ڕادەبەدەر، لە ئەندازبەدەر، پتر لە ئەندازە؛ پڕزگێک، ژەمێکی چاک، زگێ تێر: *a bellyful of advice* ◊ *I've had a bellyful of your moaning* ◌ به حد اشباع، مقدار زیاد، بیش از اندازه؛ یک وعده‌ی حسابی

**belly landing** *noun*
نیشتنەوە لەسەر زگ یان بێ‌پێچکە (فڕۆکە) ◌ فرود شکمی

**belly laugh** *noun*
قاقا، پێکەنینی لە دڵەوە، قریشکە ◌ قهقهه

**belonging** *noun*
سەربەیی، هیەتی، بەندێتی، پێوەبەندی: *a sense of belonging* ◌ تعلق، وابستگی

**belongingness** *noun*
سەربەیی، هیەتی، پێوەبەندی ◌ تعلق، وابستگی

**belongings** /bɪ'lɒŋɪŋz, US -'lɔːŋ-/ *noun, pl.*
کەلوپەل، شت‌ومەک، دارونەدار، هەیە و نییە، جروجیازی، هەبوو و نەبوو، بوون و نەبوون، شتەکان، شت‌ومت، ئەنوا، دارایی، ماڵوحاڵ: *insurance of property and personal belongings* ◌ اسباب، اموال، اثاثیه

**Belorussian** *noun, adjective,* also Byelorussian
*n* 1 خەڵکی Belarus 2 زمانی سلاڤی ڕۆژهەلاتی بیلاروس *adj* سەربە بیلاروس، خەڵک یان زمانەکەی ◌ بلاروسی

**beloved** /bɪ'lʌvd, US bɪ'lʌvɪd/ *adjective, noun*
*adj* خۆشەویست، ئازیز، لەبەردڵ، نازدار، دەلال *n* یار، ماشقە، گراو، دۆست، خۆشەویستان ◌ *adj* محبوب، عزیز *n* معشوقه، عزیزان

**below** /bɪ'ləʊ, US bɪ'loʊ/ *adverb, preposition*
1 ژێر، بنەوە، ژێرەوە، خواروو، ژێروو، خوارەوە، خوارتر، خوارتر لە، لە بنەوە، بە بن، بە ژێر، لە ژێرەوە: ◊ *They live on the floor below* 2 *Please do not write below this line* (دەریاوانی) لەژێر پشتی کەشتییەوە 3 بن یان ژێر سیفر (تیمپراچێری هەوا) 4 کەمتر لە، لەژێر، لە خوارووی، دوورتر، ئەولاتر ◌ 1 پایین، ذیل، زیر، پایین‌تر از، در پایین 2 در زیر عرشه 3 زیر سفر 4 کمتر از، آن طرف‌تر

**bellow decks** *adjective, adverb, noun,* also below deck
*adj* لە ژێرەوەی پشتی سەرەکی کەشتییەوە *n* جێگای بنەوەی پشتی سەرەکی کەشتی ◌ *adj* در زیر عرشه *n* فضای تحتانی عرشه‌ی اصلی کشتی

**Bel Paese** /ˌbel pɑː'eɪzeɪ, US -zi/ *noun*
(دروشمی بازرگانی) جۆرێ پەنیری سپی چەور، لە بنەڕەتا هی ئیتالیا ◌ نوعی پنیر

**belt** /belt/ *noun*
1 کەمەر، پشتێن، کەمەرە، پشتێنە، قایشی کەمەر، کەمەربەند (وەک نیشانەی پایە یان دەسکەوتێ، لە جۆدۆ، کاراتە و یان وەرزشی وا)، بەست، قایش، سیرمە، تەسمە (هی دەزگا و ماشێن): *to do up/fasten/tighten a belt* 2 کەنار، باریکایی، باریکە، ناوچە، مەڵبەند، دەڤەر 3 پیاکێشان یان لێدانی قورس (the belt) 4 سزادان یان تەمێ بە قایش ◌ 1 کمربند، کمر، تسمه 2 نوار، منطقه 3 ضربه‌ی سنگین 4 تنبیه با بند چرمی

**Beltane** /'belteɪn/ *noun*
فێستیڤاڵێکی کۆنی سێلتی، لە May Day دا دەگێڕێ (بنەڕەت: لە *bealltainn* گەیلی سکاتلەندی) ◌ بلتان

**belted** /'beltɪd/ *adjective*
کەمەردار، کەمبەرەدار، کەمەرەدار (جلوبەرگ) ◌ کمردار

**belter** *noun*
1 (نافەرمی) نموونەی تەواو یان دیار 2 گۆرانی یان گۆرانی‌بێژی بە دەنگی بەرز و بەقەوەتەوە ◌ 1 مثال بارز 2 بلتر

**belt highway** = belt line

**belting** *noun*

کوتەک، کوتان، کوتەککاری، تەمێ (کردن) ۞ کتک، تنبیه

**belt line** *noun*

هێڵی کەمەری یان پشتێنەیی (شەمەندەفەر، پاس و هتد)، ڕێگای دەوری شار ۞ خط کمربندی

**beltman** *noun, pl.* beltmen

ئەندامی دەستەی مەلەوانی ڕزگارکەر ۞ عضو تیم غریق نجات

**belt-thghtening** *noun*

توندکردنی پشتێنەکان، لەخۆگرتنەوە، بەرتەسکی لە خەرج کردندا، سکهەڵگوشین ۞ ریاضت اقتصادی

**beltway** /'beltweı/ *noun*, also ring road

ڕێگای پشتێنەیی یان بازنەیی، ڕێگا یان جادەی کەمەربەندی ۞ جادەی کمربندی

**beluga** /bə'lu:gə/ *noun, pl.* same or belugas

1 نەهەنگەسپی، جۆرێ نەهەنگی سپی ددانداری چکۆلە، سەربە narwhal | *Delphinapterus leucas*] 2 جۆرێ ماسی کاڤیاری یەکجار زلە، کاڤیار یان خاویاری لێدەگیرێ [*Huso huso*] ۞ بلوگا

**belvedere** /'belvədıə(r), US -dır/ *noun*

(ئیتالیایی) دیارگە، دیمەنڕوان ۞ کلاەفرنگی، مهتابی

**belying** = past participle of belie

**bema** /'bi:mə/ *noun*, bemas or bemata

1 بەرزەک: بەشی میحراب لە کلیسە ئۆرتۆدۆکس و کۆنەکاندا 2 سەکۆی دووان یان وتاردەران لە ئاتینی کۆندا (لە *bēma* یونانی "هەنگاو، شوێنی بەرز") ۞ بما

**Bemba** /'bembə/ *noun, pl.* same or Bembas

1 بێمبا، ئەندامی گەلی ئەفریکایی زامبیا Zambia 2 زمانی بانتۆیی Bantu ئەو گەلە ۞ بمبا

**bemused** /bı'mju:zd/ *adjective*

سەرسووڕماو، تاساو، سەرسام، گێژ، وڕ، کاس، سەرلێشێواو، bewildered: *a bemused expression/smile* ۞ سردرگم، گیج

**bemusedly** /bı'mju:zıdli/ *adverb*

بەشێوەیەکی سەرلێشێواو ۞ به طور سردرگم

**ben**[1] *noun*

(لە سکاتلەند) چیای بەرز، کێوی بڵند، ترۆپک: *Ben Nevis* ۞ کوه بلند، قله

**ben**[2] *adverb, preposition, adjective, noun*

1 لە نێوەوە، لەنێو، لە ژوورەوە 2 نێوخۆیی، نێوەوەیی، سەربە ژوورەوە 3 دیوی پشتەوە ۞ 1 توی، درون 2 داخلی 3 اتاق عقب

**bench** /bentʃ/ *noun*

1 مێز، قەنەفە، کورسی، تەخت، سەکۆ، تەختە، مێز یان مێزی کار 2 تەختە یان مێزی کار 3 دادگەر، دادوەر، دادپرس 4 دادگا، دەستەی دادگەران (دادوەران) 5 کورسیی دادگایی 6 کارگە، دەزگا 7 سەکۆی پیشاندانی سەگەکان ۞ 1 نیمکت 2 میز کار 3 قاضی 4 قضات 5 محکمەی عدالت، مسند قضاوت 6 کارگاه 7 بنچ

**bencher** *noun*

1 دادگەر، دادوەر، قازی 2 سەناتۆر ۞ 1 قاضی 2 سناتور

**benchmark** /'bentʃma:k, US -ma:rk/ *noun*

1 پێوەر، پێودانگ، ئەندازە، پێوانە، هەڵسەنگێنە 2 (لە خانووسازیدا) نیشان، نیشانە ۞ 1 ملاک، معیار 2 انگپایه

**bench press** *noun*

(بادیبیلدینگ یا لەشپەروەری) مێزی پرێس ۞ میز پرس

**bench seat** *noun*

(ماشێن) کورسی یان سەندەڵی دواوە، کورسی پشتەوە ۞ صندلی عقب

**bench warrant** *noun*

بڕیاری دەسبەسەری ۞ حکم بازداشت

**bend** /bend/ *noun*

1 خواروخێچی، پێچ، گەڕ، چەم، چەماوی، خواری، ئەژنۆیی، چەمانەوە، خواربوونەوە، نووچ، داهاتنەوە، نووشتانەوە 2 گرێی مەلەوانی ۞ 1 پیچ، خمیدگی، زانویی، انحنا 2 گره ملوانی

**bended** *adjective*, on bended knee

بە چۆکداهاتوو، ملکەچانە، بەسزمانانە، لەگەڵ پاڕانەوە، بە لالانەوە ۞ به زانو افتاده، عاجزانه

**bended** = past and past participle of bend

**bender** /'bendə(r)/ *noun*, go on a bender

1 تا قوڕقوڕاچکە خواردنەوە، تێنەپاندن، ماوەی خواردنەوە: *to go on a bender* 2 (سووکانە) پیاوی هاوڕەگەزباز homosexual ۞ 1 تا خرخره مشروب خوردن، مدت مشروبخواری 2 مرد همجنسباز

**bends** *noun, pl.*

بێندز (= جۆرێ نەخۆشی لە ئەنجامی کەمبوونەوەی کتوپڕی هەوا)، decompression sickness ۞ بندز

**bendy** /'bendi/ *adjective*

پێچەلاوپێچ، پێچەڵپێچ، خواروخێچ، نەرم، لەچەمانهاتوو، دەچەمێتەوە ۞ پرپیچ و خم، خمشدنی، انعطافپذیر

**beneath** /bı'ni:θ/ *preposition, adverb*

1 لە ژێر، بن، لە بن، لە خوارووی، خوار، لە خوارەوە، خوارتر لە: *beneath the surface* 2 بێبایەخ، لێنەوەشاوی: *beneath his dignity* (ئەڵمانی بنەڕەت) ۞ 1 زیر، در زیر، پایین، پایینتر از، از پایین 2 فاقد ارزش

**benedick** /'benədık/ *noun*, also Benedick

پیرزاوا، قەیرەزاوا (کەسێ کە دوای ماوەیێکی زۆر ژنی هێنابێ) ◌ نوداماد

**benedicite** /ˌbenɪˈdʌɪsɪti/ *noun*
دۆعای بەرلە نان ◌ دعای قبل از غذا

**Benedictine** /ˌbenɪˈdɪktɪn/ *noun, adjective*
*n* 1 بێنێدیکتی (ئەندامی کۆمەڵی کریستانیەت کاسۆلیکی رۆمانی کە شوێنکەوتووی سەینت Benedict) 2 (دروشمی بازرگانی) بێنێدیکتین (جۆرێ خواردنەوەی ئەلکۆلی، لە بنەڕەتا لە لایەن رەبەنەکانی بێنێدیکتی فەرەنسەوە ساز دەکرا) *adj* سەربە سەینت بێنێدیکت یان بێنێدیکتی‌یەکان ◌ بندیکتین

**Benedictus** *noun*
1 (کلێسەی کریستیەن) سرودێ کە بە *Benedictus Dominus Deus* دەس پێ‌دەکا، لە Luke 1:68–79 2 سرودێ کە بە *Benedictus qui venit in nomine Domini* دەس پێ‌دەکا، لە Matthew 21:9 ◌ بندیکتوس

**benediction** /ˌbenɪˈdɪkʃn/ *noun*
دۆعا، نزا: *to sing/say/give a benediction* ◌ دعا

**benedictory** *adjective*
دۆعایی، نزایی، تکاکارانە، داخوازی‌یانە ◌ دعائی، تمنایی

**benefaction** /ˌbenɪˈfækʃn/ *noun*
خێرخوازی، چاکەکاری، بەخشین، بەخشش، پیتاک، یارمەتی، باربۆ، کۆمەک، کردەوەی چاکە، کاری باشە ◌ نیکی، نیکوکاری، کرم، عمل خیر، احسان، کمک

**benefactor** /ˈbenɪfæktə(r)/ *noun*
1 چاکەکار، خێرخواز، خێرۆمەند، خێرەومەند: *friends and benefactors of the hospital* 2 تەرخانگەر ◌ خیر، آدم نیکوکار 2 واقف

**benefactress** *noun, fem.* benefactor

**benefic** = beneficent

**benefice** /ˈbenɪfɪs/ *noun*
1 تیول، کەلەبەر 2 تەرخانکراو، تەرخانی، تەرخانە 3 داهاتی کلێسەیی 4 پۆستی کلێسەیی خاوەن‌داهات 5 داهاتی تەرخانە 6 خێر، قازانج، بەهرە 7 چاکە ◌ 1 تیول 2 موقوفە 3 درآمد کلیسایی 4 منصب کلیسایی دارای درآمد 5 درآمد موقوفە 6 سود 7 لطف

**beneficed** *adjective*
بۆ تەرخانکراو ◌ موقوف‌علیه

**beneficence** /bɪˈnefɪsns/ *noun*
چاکەکاری، خێرخوازی، پیتاک، باربۆ، یارمەتی، کۆمەک ◌ نیکوکاری، احسان، اعانه

**beneficent** /bɪˈnefɪsnt/ *adjective*
1 چاکەکار، خێرخواز، خێرۆمەند، خێرەومەند، generous: *the -eficent powers of Nature*
beneficently ) beneficial – 2 benefaction *adv*) ◌ خیر

**beneficial** /ˌbenɪˈfɪʃl/ *adjective*
بەقازانج، سوودبەخش، بەکەڵک، بەخێر، بەبەهرە، خێربەر، خێرپێ‌گەیشتوو، قازانجبەر: *A good diet is beneficial to health* beneficially ) beneficialness *n* ◌ (/ˌbenɪˈfɪʃli/ *adv*
نافع، سودمند، مفید، سودبرنده

**beneficiary** /ˌbenɪˈfɪʃəri, US -ˈfɪʃieri/ *noun, pl.* beneficiaries
1 بەشبەر، خێربەر، یارمەتی‌گر، پیتاکگر، باربۆگر 2 داهاتگری کلێسەیی ◌ 1 وارث، سودبرنده 2 بنفیشری

**benefit** /ˈbenefit/ *noun*
1 قازانج، بەرژەوەندی، مەفا، کەڵک، بەهرە، سوود، بارە، بارەچە، باشی: *I've had the benefit of a good education* 2 بەراوە 3 کردەوەی خێرخوازانە، کاری چاکە، پیتاک، یارمەتی، باربۆ 4 ئاهەنگی خێرخوازی ◌ 1 نفع، فایده، استفاده، مزیت 2 مقرری 3 اقدام خیریه، اعانه 4 جشن نیکوکاری

**benefit society** = Friendly Society

**Benelux** /ˈbenɪlʌks/ *noun,* acronym from Belgium, Netherlands, and Luxembourg
بێنێلوکس (= سێ ولاتی بێلژیک، هولەند و لوکسەمبورگ) ◌ بنلوکس

**benevolence** /bəˈnevələns/ *noun*
1 نیازباشی، چاکەکاری، خێرخوازی، کردەوەی خێرخوازانە، کاری چاکە 2 پیتاک، باربۆ، یارمەتی، کۆمەک ◌ 1 حسن نیت، نیکوکاری، احسان، عمل خیر 2 اعانه

**benevolent** /bəˈnevələnt/ *adjective*
1خێرخواز، چاکەکار، رووخۆش، خێرخوازانە، چاکەکارانە: *a benevolent attitude* 2 خێرخوازی، چاکەکاری ◌ 1 خیرخواه، نیکوکار، گشاده‌رو، خیرخواهانه 2 خیریه

**benevolently** /bəˈnevələntli/ *adverb*
1 رووخۆشانە، بە رووخۆشی‌یەوە: *smiling benevolently* 2 خێرخوازانە ◌ 1 با گشادەرویی 2 خیرخواهانه

**benevolent fund** *noun*
سنووقی خێروخێرات، سنووقی خێرخوازی ◌ صندوق خیریه

**B Eng** *abbreviation* Bachelor of Engineering
بەکالۆر لە ئەندازیاری‌دا ◌ کارشناسی مهندسی

**Bengali** /beŋˈgɔːli, US -ˈgɑːli/ *adjective, noun, pl.* Bengalis
*adj* سەربە بێنگال، بێنگالی *n* 1 خەڵکی بێنگال، بێنگالی 2 زمانی Indic بەنگلادیش و رۆژاوای بێنگال، بە رێنووسێکی نزیک بە Devanagari دەنووسرێ ◌ *adj* بنگالی *n* 1 اهل بنگال 2 زبان

بنگالی

**bengaline** *noun*
جۆرێ پارچە یان کوتاڵی ڕیزڕیز (لە ریشاڵەکانی نایلۆن، رایۆن، کەتان و خوری دروست دەکرێ) ◌ نوعی پارچه

**Bengal light** *noun*
رەنگی شینی گەش یان کاڵ (= چاران ب.ت. بۆ ئاگادارکردنەوە یا رۆشنایی بەکاردیترا) ◌ رنگ آبی روشن

**Bengal tiger** *noun*
(گیانەوەرناسی) بەور یان پڵنگی بێنگاڵ (ب.ت. لە هیند [*Panthera tigris tigris*]) ◌ ببر بنگال

**benighted** /bɪˈnaɪtɪd/ *adjective*
1 نەزان، رەشبیر، تینەگەیشتوو، بیرتەسک 2 بەدبەخت، کڵۆڵ، لێقەوماو ( benightedly *adv*) ◌ 1 جاهل، ظلمت‌زده 2 مصیبت‌زده

**benightedness** *noun*
1 نەزانی، رەشبیری، تینەگەیشتوویی، بیرتەسکی 2 بەدبەختی، کڵۆڵی، لێقەوماوی ◌ 1 جاهلی، ظلمت‌زدگی 2 مصیبت‌زدگی

**benign** /bɪˈnaɪn/ *adjective*
1 دڵنەرم، بەبەزەیی، دڵسۆز، بێ‌وەی، *benign faces* ◊ *a benign teacher* :gracious 2 (هەوا) خۆش، سازگار، گونجاو، *a benign climate* :wholesome ,favourable 3 بێ‌مەترسی، خۆش‌خوو (تومۆر و نەخۆشی، بروانە malignant) ◌ 1 رئوف، مهربان 2 ملایم، مطبوع 3 خوش‌خیم، بی‌خطر

**benignancy** /bɪˈnaɪnsɪ/ *noun*
دڵنەرمی، دڵسۆزی، دڵۆڤانی ◌ مهربانی، شفقت

**benignant** /bɪˈnɪgnənt/ *adjective*
1 دڵنەرم، بەبەزەیی، دڵسۆز، بێ‌وەی: *a benignant power* 2 بێ‌مەترسی (تومۆر و نەخۆشی؛ benignantly *adv*) ◌ 1 مهربان، ملایم 2 خوش‌خیم

**benignity** /bɪˈnɪgnətɪ/ *noun, pl.* benignities
دڵنەرمی، بەبەزەیی‌یەتی، دڵسۆزی، دڵۆڤانی ◌ مهربانی، شفقت

**benignly** /bɪˈnaɪnli/ *adverb*
بە دڵنەرمی‌یەوە: *He smiled benignly* ◌ با مهربانی

**Beninese** /ˌbɛnɪˈniːz/ *noun, adjective*
*n* خەڵکی بێنین، ولاتێ لە رۆژاوای ئەفریکا *adj* سەربە بێنین یان خەڵکەکەی ◌ بنینی

**benison** /ˈbɛnɪz(ə)n, US -s-/ *noun*
(ویژەیی) چاکەی خودایی، بەزەیی خوایی، رەحمەت، دۆعا یان نزای بەخێر، هەروەها benediction ◌ رحمت، دعای خیر

**Benjamin** /ˈbendʒəmən/ *noun*, Hebrew *Binyāmīn*
ب(ی)نجامین، بنیامین (کوری Jacob دەڵێن سەرڕەچەڵەکی یەکێ لە هۆزەکانی ئیسرائیلە) ◌ بنیامین

**benne** /ˈbɛni/ = sesame

**bent**[1] /bɛnt/ *noun, adjective*
*n* 1 داشکانەوە، لاربوونەوە، حەز، ویست، ئارەزوو 2 توانایی، جەوهەر، بەهرە 3 لاری، خواری، کەچی *adj* 1 خواروخێچ، چەوتاوە، لار، ناڕاست، خوار، کەچ، دووتا، دووقەد، نووشتاوە 2 (سووکانە) هاوڕەگەزباز، هۆمۆسێکشواڵ 3 نادروست، ناڕاست، دەس‌پیس، حەرام‌خۆر، ناپاک، دەغەڵ، بەرتیل‌خۆر 4 بەبڕیار، پتەو، شێلگیر ◌ *n* 1 گرایش، تمایل 2 استعداد، توان 3 کجی *adj* 1 کج، خمیده 2 هم‌جنس‌باز 3 فاسد، دغل، نادرست، رشوه‌بگیر 4 مصمم

**bent**[2] /bɛnt/ *adjective*
مێرگ، چیمەنی تەرزخەر [ *Agrostis capillaries* و جۆرەکانی تر] ◌ مَرغ

**bent**[3] /bɛnt/ = past and past participle of bend

**Benthamism** /ˈbɛnθəmɪz(ə)m/ *noun*
بێنتامباوەری (فەلسەفەی Bentham 1748-1832) ◌ بنتام‌گرایی

**Benthamite** *noun, adjective*
*n* بێنتامباوەر *adj* بێنتامباوەڕانە ◌ *n* بنتام‌گرا *adj* بنتام‌گرایانه

**benthic** *adjective*, also benthonic or benthal
1 سەربە benthos 2 سەربە قووڵایی (دەریا یان ئۆقیانووس)، دەریابنی ◌ 1 وابسته به benthos 2 وابسته به ژرفنایی

**benthology** *noun*
قووڵاوژی‌ناسی، ژێراوژی‌ناسی، بناوژی‌ناسی، بێنتۆلۆژی ◌ بناب‌زی‌شناسی

**benthos** /ˈbɛnθɒs/ *noun*
(ژینگەناسی) flora و fauna کە لە بنکی دەریا و گۆماوەکاندا دۆزراونەتەوە، دەریابن ◌ بنتوس

**bentwood** *noun*
داری شێوەپێدراو یان دەق‌دراو ◌ بنت‌وود

**Benue-Congo** /ˈbɛnweɪ/ *noun*
بێنوێ-کۆنگۆ (لقی سەرەکی خێزانی زمانەکانی نایجیر-کۆنگۆیی Niger-Congo، وەکوو ئێفیک Efik و فولا Fula) ◌ بنوی-کونگو

**benumbed** *adjective*
تەزیو، سڕ، گۆنەکەر، بێ‌هەست ◌ بی‌حس، کرخ

**benzaldehyde** *noun*
جۆرێ شلەی ئارۆماتیکی بێ‌ڕەنگی نازاراوی $C_6H_5CHO$، لە رۆنی عەتردا (وەک لە دەنکی کۆخ) دۆزراوەتەوە ◌ بنزالدهید

**benzanthracene** *noun*
هایدرۆکاربۆنی ئالقەیی carcinogenic کریستالی $C_{18}H_{12}$ کە بە رێژەیێکی کەم لە

قەتراندا دۆزراوەتەوە ۞ بنزانتراسن

**Benzendrine** /ˈbɛnzɪdriːn/ *noun*, trademark for amphetamine

بێنزێندرین (= جۆرێکی ئامفیتامین، لە ئەمریکا) ۞ بنزیندرین

**benzene**[1] /ˈbɛnziːn/ *noun*

بێنزین (= شلەیەکی زووهەڵمیوی بێڕەنگە کە لە نەوت و قەترانی خەڵووز بەدەستدێتری $C_6H_6$، بۆ دروستکردنی پلاستیک و زۆر بەرهەمی تری کیمیایی بەکاردێتری) ۞ بنزن

**benzene**[2] /ˈbɛnziːn/ *noun*

بێنزین (= بەرهەمی نەوتی خاو) ۞ بنزین

**benzene hexachloride** *noun*, also BHC

1 هەمەموو بەرهەمەکانی کلۆرایدی stereoisomeric [$C_6H_6C_{16}$] ی cyclohexane کە لەودا تێکرای گەردیلەکانی کلۆراین دەنووسێن بە گەردیلەکانی کاربۆنی جیاوازەوە 2 = lindane ۞ هگزاکلورید بنزین

**benzene ring** *noun*

ئالقە یان بازنەی بێنزین ۞ حلقەی بنزن

**benzenoid** *adjective*

بێنزینئاسا ۞ بنزینمانند

**benzenonium ion** *noun*

(کیمیا) ئایۆنی بێنزێنۆنیۆم ۞ یون بنزنونیوم

**benzidine** *noun*

بێنزیداین، بێنزیدین: بەیسی دیامینی diamine کریستالی $C_{12}H_{12}N_2$، بۆ سازکردنی azo dye بەکاردێتری، ب.ت. Congo red ۞ بنزیدین

**benzimidazole** *noun*

1 بەیسێکی کریستالی $C_7H_6N_2$، ب.ت. بۆ ڕێگرتن لە هەڵدانی فایرۆسی جۆراوجۆر، کرمە مشەخۆرەکان بەکاردێتری 2 یەکێ لە بەرهەمەکانی ۞ بنزیمیدازول

**benzine** /ˈbɛnziːn/ *noun*, benzin /-zɪn/

بێنزین، تێکەڵەی هایدرۆکاربۆنە شلەکان کە لە نەوتی خاو دەگیرێ، تێکەڵەیێکی ئاوەکی بێڕەنگی هایدرۆکاربۆنە جۆربەجۆرەکان، لە دڵۆپاندنی distillation نەوت بە دەست دێتری ۞ بنزین

**benzoate** *noun*

خوێ یان ئێستێری benzoic acid ۞ بنزوات

**benzoate of soda** = sodium benzoate

**benzodiazepine** /ˌbɛnzəʊdʌɪˈeɪzɪpiːn, US -ˈazəpiːn/ *noun*

(پزشکی) هەریەک لە چینی ئاوێتە ئەندامییە جیابازنە heterocyclicکان، وەکوو لیبریۆم و ڤالیۆم بۆ ئارامکردنەوە بەکاردێتری (بنەڕەت: لە -ine[4] + epi- + azo- + di-[1] + benzene پێکهاتووە) ۞ بنزودیازپین

**benzofuran** = coumarone

**benzoic** *adjective*

سەربە یان لە benzoin بەرهەم هاتووە (یا وەرگیراوە) ۞ بنزویک

**benzoic acid** *noun*

(کیمیا) ترشەڵۆکی بێنزۆیک، ئاوێتەیێکی بلووریی سپی $C_6H_5COOH$، لە نێو بێنزۆیندا هەیە ۞ بنزویک اسید

**benzoic aldehyde** = benzaldehyde

**benzoin** /ˈbɛnzəʊɪn/ *noun*

بێنزۆین، بێنزۆئین 1 (هەروەها gum benzoin) جۆرێ جەوکی resin کەتیرەی بۆنخۆش، لە هێندێ داری storax ی ڕۆژهەلاتی ئاسیا دەگیرێ 2 (کیمیا) کیتۆنێکی hydroxy ئارۆماتیکی کریستالی سپی $C_{14}H_{12}O_2$، لە نێو ئەو جەوکەدا هەیە (بنەڕەت: لە *benjoin* فەرەنسی، لەسەر بنچینەی *lubānjāwī* عەرەبی "بخوری جاڤا "incense of Java) ۞ بنزوین، بنزوئین

**benzoin condensation** *noun*

(کیمیا) خەستی بێنزۆین ۞ تراکم بنزوینی

**benzol** /ˈbɛnzɒl/ *noun*, also benzole /-zəʊl/

(کیمیا) بێنزۆل (ب.ت. بێنزینی نەپاڵێوراو) ۞ بنزول

**benzophenone** *noun*

(کیمیا) بێنزۆفینۆن: کیتۆنی کریستالی بێڕەنگ $C_{13}H_{10}O$، لە گوڵاوسازیدا بەکاردێتری ۞ بنزوفنون

**benzopyrene** /ˌbɛnzə(ʊ)ˈpʌɪriːn/ *noun*, also benzo[a]pyrene

(کیمیا) بێنزۆپایرین: هایدرۆکاربۆنی ئارۆماتیکی کریستالی زەرد carcinogenic $C_{20}H_{12}$، لە قەتراندا دۆزراوەتەوە ۞ بنزوپیرین

**benzoquinone** /ˌbɛnzə(ʊ)ˈkwɪnəʊn/ *noun*

(کیمیا) بێنزۆکوینۆن: ئاوێتەیێکی کریستالی زەرد $C_6H_4O_2$، پێوەندی بە benzene ـەوە هەیە ۞ بنزوکوینون

**benzoyl** /ˈbɛnzəʊʌɪl, US -zəʊɪl/ *noun*

(کیمیا، وەکوو ئاوەڵناو) بێنزۆیل: کۆمەڵی تاکهاوهێزی $C_7H_5O$-، لە benzoic acid وەردەگیرێ ۞ بنزوئل

**benzyl** /ˈbɛnzʌɪl, US -zɪl/ *noun*

(کیمیا، وەکوو ئاوەڵناو) بێنزیل $C_6H_5CH_2$ ۞ بنزیل

**benzylic** *adjective*

(کیمیا) بێنزیلی، سەربە بێنزۆیل ۞ وابستە بە بنزیل

**benzylic position** *noun*

(کیمیا) ڕەوشی بێنزیلی ۞ موقعیت بنزیلی

**benzoyl peroxide** *noun*

پێرۆکسایدی بێنزۆیل: ئاوێتەیێکی کریستالی زەرد $C_{14}H_{10}O_4$، لە بواری پزشکیدا ب.ت. بۆ چارەسەری acne بەکاردێتری ۞ پروکسید بنزوئل

**benzyne** *noun*

(کیمیا) بێنزاین ۞ بنزاین

**Beowulf** *noun*

بائۆلف، بیووۆلف، شەڕکەر و پاڵەوانی ئەفسانەیی گیتی Geatish، هی نێو هەڵبەستی ئینگلیسی کۆن (Beowulfian *adj*) ۞ بئولف، بی‌ولف

**bequest** /bɪˈkwest/ *noun*

1 میرات، بەش، بۆماوە، کەلەپوور 2 بەجێ‌هێشتنی میرات یان کەلەپوور ۞ 1 ارث، میراث 2 ارث‌گذاری

**Berber** *noun, adjective*

*n* سەربە بەربەر *adj* 1 بەربەری (باکووری ئەفریکا) 2 زمانی (Afro-Asiatic) بەربەری ۞ *n* وابسته به بربری *adj* 1 بربری 2 زبان بربری

**berberis** /ˈbɜːbərɪs/ *noun*

(رووەکناسی) گیای تیرەیێ کە barberry ـەکان دەگرێتەوە [تۆخم *Berberis*] ۞ نوعی گیاه

**berceuse** /beːˈsɜːz/ = lullaby, *pl.* berceuses pronunc. same (French)

**bereaved** /bɪˈriːvd/ *adjective, noun*

*adj* 1 زگسووتاو، کۆستکەوتوو، ماتەمبار، ماتەمگرتوو، عەزیەتبار، تازیەبار، شیوەن‌گێڕ 2 بێبەش، بێبەری *n* کەسێکی کۆستکەوتوو یان ماتەمبار ۞ *adj* 1 ماتم‌زده، داغ‌دار، عزادار 2 محروم *n* آدم داغ‌دار

**the bereaved** *noun*

زگسووتاوان، کۆستکەوتووان، تازیەباران، ماتەمباران ۞ ماتم‌زدگان

**bereavement** /bɪˈriːvmənt/ *noun*

1 کۆست، زگسووتان، ماتەم، تازیەباری، عەزیەتی، شیوەن‌گێڕی، شین، ماتەمگرتوویی 2 بێبەشی، بێبەریتی 3 لەدەس‌چوون ۞ 1 مصیبت، ماتم، داغ، داغدیدگی 2 محرومیت 3 فقدان

**bereft** /bɪˈreft/ *adjectived*

1 بێبەش لە، بێبەری لە 2 بێ، تەنیا، بێکەس‌وبێدەر ۞ 1 محروم از 2 فاقد، تنها

**beret** /ˈbereɪ, US bəˈreɪ/ *noun*

کڵاوی بێرێ ۞ بر

**berg**[1] /bɜːg, US bɜːrg/ = iceberg

**berg**[2] /bɜːg/ *noun*

(ئەفریکای باشووری، لە هولەندییەوە) چیا، کێو، گرد، تەپ ۞ کوه، تپه

**bergamot**[1] /ˈbɜːgəmɒt/ *noun*

1 ماکێکی رۆنی کە لە پرتەقاڵی Seville دەگیرێ و لە شتومەکی ئارایشت و وەک بۆنخۆشکەری چای Earl Grey بەکاردێنرێ 2 (هەروەها bergamot orange) ئەو دارە 3 جۆرێ رووەکی بۆنخۆشی ئەمریکای باکووری لە تیرەی mint [*Monarda didyma*] و جۆرەکانی تر] (بنەڕەت: لە ناوی *Bergamo* لە باکووری ئیتالیا) ۞ برگاموت

**bergamot**[2] /ˈbɜːgəmɒt/ *noun*

جۆرێ دیسیری هەرمێ ۞ نوعی دسر گلابی

**bergenia** /bəˈgiːnɪə/ *noun*

جۆرێ رووەکی ئاسیایی هەمیشەسەوز [تۆخم *Bergenia*] ۞ نوعی گیاه

**bergschrund** /ˈbɜːgʃrʊnd/ *noun*

کەلەبەری قووڵی روو‌باری سەهۆڵین، کەلێنەکێو، کەلەبەرەچیا (لە ئەڵمانییەوە، *Berg* "چیا" + *Schrund* "کەلەبەر، کەلێن") ۞ برگشروند

**Bergsonian** /bɜːgˈsəʊnɪən/ *adjective*

بێرگسۆنی: سەربە فەلسەفەی فیلسووفی فەرەنسی Henri Bergson (1859–1941) ۞ برگسونی

**berg wind** *noun*

(ئەفریکای باشووری) بای رووباکووری گەرم و وشک، لە نێوەوە هەڵدەکا بەرەو ناوچە کەنارییەکان ۞ باد برگ

**beriberi** /ˌberiˈberi/ *noun*

بێریبێری (نەخۆشییەکە لە ئەنجامی کەمبوونی ڤیتامین B کۆئەندامی دەماری تووش‌دەکا) ۞ بری‌بری

**berk** /bɜːk, US bɜːrk/ *noun*

(تافەرمی و لە بریتانیا) مرۆی گەوج‌ولەوج، بنیادەمی کەرونەفام: *I felt a right berk!* ۞ آدم احمق

**berkelium** /bɜːˈkiːliəm, ˈbɜːkliəm, US ˈbɜːrkliəm/ *noun*

(کیمیا) بێرکێلیۆم (بە ز.گ. 97، ن. Bk؛ بنەڕەت: لە ناوی زانکۆی بێرکلی *Berkeley* لە کالیفۆرنیا، یەکەم جار لەوێ سازکرا) ۞ برکلیوم

**Berks.** *abbreviation* Berkshire

**Berkshire** *noun*

بێرکشایر: جۆرێ رەگەزی بەرازی مامناوەندی رەش و سپی ۞ برکشایر

**Berkeleian** *adjective, noun*

1 سەربە ئۆسقۆف بێرکلی Berekley یان سیستمی ئایدیالیزمی فەلسەفییەکەی 2 لایەنگری فەلسەفەی بێرکلی ۞ برکلین

**Berkeleianism** *noun*

بێرکلیباوەڕی، بێرکلیەنیزم ۞ برکلینیسم

**Berliner** *noun*

بێرلینی، برلینی، خەڵکی بێرلین ۞ اهل برلین، برلینی

**berm** /bɜːm/ *noun*

باریکایی، باریکە ۞ باریکه

**Bermuda bag** *noun*

جانتا یان کیفی بێرمودایی: جۆرێ کیف یان جانتای خڕ و هێلکەیی ژنانە، دەسکەکانی لە دارن ۞ نوعی کیف

**Bermuda grass** *noun*

فریزوو، فریز، هەرێز [*Cynodon dactylon*] ۞ برمودا گراس

**Bermuda lily** *noun*

زەمبەقی بێرمودا [*Lilium longiflorum eximium*] ۞ نوعی گل

**Bermuda mountain dog** *noun*
جـۆرێ نـژادی سـەگێکـی رەشـی بـەهێـز و تـووکدرێـژی بنـەڕەت سویـسی، زۆرتـر وەک گیانەوەریکی راکێشان بەرەی پێدرا ◌ نوعی سگ

**Bermudan** /bə'mju:d(ə)n/ *noun, adjective*
*n* خـەڵـکی بێرمـودا، بێرمـودایی Bermuda *adj* سـەربە بێرمودا یان خەڵکەکەی ◌ برمودایی

**Bermuda onion** *noun*
پیوازی بێرمـودا (بـانی زلە، تـوێخ سـوور، زەرد و سپی) ◌ پیاز برمودا

**Bermuda rig** *noun*, also Marconi rig
جـۆرێ بـادەوەی سـێ سـووچ کـە لـە پـێش و پشتەوەی کەشتی دادەبەسرێ ◌ برمودا ریگ

**Bermuda shorts** /bə,mju:də 'ʃɔ:ts, US bər,m-, 'ʃɔ:rts/ *noun, pl.*, also Bermudas /bə'mju:dəz, US bər'm-/
شەڵـواری کـورت، شـاڵـواری تاسـەر چـۆک ◌ شلوار کوتاه

**berry** /'beri/ *noun, pl.* berries
1 توو، نێوک، ناوک، کـاکڵ، دەنـک، دان 2 میـوە یان بەری توویی یان بۆلی 3 گەرای ماسی ◌ 1 هسته، حبه، دانه 2 بری 3 تخم ماهی

**berseem** *noun*, also Egyptian clover
شـەوەری میـسری، سـێپەرە: جـۆرێ شـەوەری یـەکساڵـەی شـیلەدار، ب.ت. هـی خاکـە alkaline ـەکـانی دۆڵـی نیـل و باشـووری رۆژاوای ئـەمریکـا، وەک گیـای تفـاق دەکـرێ [*Trifolium alexandrinum*] ◌ برسیم

**berserk** /bə'zɜ:k, -'sɜ:k, US bər'zɜ:rk, -'sɜ:rk/ *adjective*
1 کفردەرهـاتوو، تـوورە، بەردبـەباکردوو، شـێت: *He went berserk when he found out* 2 *where I'd been* (هـەروەها berserker) شەرکەری Norseی کۆن (یان سکاندینافی) کە شێتانە یا توندوتیژانە شەڕی دەکرد ◌ 1 عصبانی، دیوانه 2 برسرکر

**berth** /bɜ:θ, US bɜ:rθ/ *noun*
1 لەنگـەرگا 2 کـابین یـان شـوێنی خـەوتن، جـێ خـەوی کەشتی، خەوتنگە (لە فرۆکە یـان کەشـتی) 3 جـێ، جێگـا، شـوێن 4 کـار، ئـیش، ئەرک، فرمـان ◌ 1 لنگرگـاه 2 کـابین یـا محـل خواب 3 جا 4 شغل، وظیفه

**bertha** *noun*
(مێژوویی) ملیوان یا یەخەی پانی سەرجل ◌ برتا

**beryl** /'berɪl/ *noun*
زمروت، یاقووتی شین ◌ زمرد، بزادی

**berylliosis** /bə,rɪlɪ'əʊsɪs/ *noun*
ژاراوی‌بوون بە بێریلیۆم یان ئاوێتەکانی بێریلیۆم ◌ بریلیوسیس

**beryllium** /bə'rɪliəm/ *noun*
(کیمیـا) بێریلیـۆم (بـە ژ.گ. 4، ن. Be؛ بنـەڕەت: لاتینی نوێ، لە *bēryllion* یۆنانی) ◌ بریلیوم

**beseeching** /bɪ'si:tʃɪŋ/ *adjective*
بەپارانەوە ◌ ملتمسانه

**beset** /bɪ'set/ = past and past participle of beset

**besetting** *adjective*
بەتەنگ‌هێنەر، هاراسان‌کەر، ملۆزم، یەخـەگر ◌ به ستوه‌آورنده، مزاحم

**beside** /bɪ'saɪd/ *preposition*
1 لە پاڵ، لە کن، لە تەنیشت، پاڵ، نزیکی، لەلای، بـە دیـار: *He sat a mill beside a stream* 2 *walk beside me beside her all night* لەچاو، لە بەرامبەر، لە هەمبـەر: *My painting* 3 *looks childish beside yours* پێجگەلە، جگە لە 4 شان‌بەشانی، پێ‌بەپێی ◌ 1 در کنـار، پـیش، پهلوی، مجاور 2 نسـبت به، در مقایسه با 3 به جز 4 دوش‌به‌دوش

**besides** /bɪ'saɪdz/ *adverb, preposition*
سـەرباری ئەمـەش، لەمانـەش بـوگزەرێ، بـەدەر لەمانـەش، سـەرەڕای ئـەوەش، جگەلـە، لەگـەڵ ئەمەش‌دا، ـش، ژێ: *Besides working as a doctor, he also writes novels in his spare discounts on televisions, stereos ◊ time I've got no ◊ and much more besides family besides my parents* ◌ علاوه بر ایـن، گذشته از این، به غیر از، هم

**besiegement** /bɪ'si:dʒmənt/ *noun*
ئابلۆقە، گەمارۆ، دەوردان ◌ محاصره

**besom** /'bi:zəm/ *noun*
1 گـسـکەکۆتەرە، قارووشـە 2 (سـووکانە) گـسکەکۆتەرە، ژن، کـچ (ئـەڵـمانی رۆژاوایـی بنەڕەت) ◌ 1 جاروترکەای 2 زن، دختر

**besotted** /bɪ'sɒtɪd, US -'sɑ:t-/ *adjective*
شـێت، مەسـت، ئاشـق (لەبـەر ئـەوین‌داری) ◌ مست، دیوانه

**besought** /bɪ'sɔ:t/ = past and past participle of beseech

**bespangled** *adjective*
پوولـەکەرێژ، پوولـەکەلێنراو، رازاوە بـە پوولـەکە ◌ پولک‌دوزی‌شده

**bespattered** *adjective*
1 پیس، تێوەدراو، لێوەدراو 2 (خوازە) خـاڵاوی، پەڵاوی، لکەدار، لکەپێوەبوو ◌ 1 آلوده 2 لکه‌دار

**bespectacled** /bɪ'spektəkld/ *adjective*
چاویلکـەیی، عـەینـەکـی، چاویلکەلـەچاو، عەینەک‌لەچاو ◌ عینکی

**bespoke** /bɪ'spəʊk, US bɪ'spoʊk/ *adjective*
کەسانە، تایبەتی، کەسانەدروو (بـەرگـدروو) ◌ سفارشی، سفارشی‌دوز

**bespoke** /-spəʊk, US -spoʊk/ = past and

past participle of bespeak
**bespoken** /-'spəʊkən, US -'spoʊ-/ = past participle of bespeak
**Bessemer converter** *noun*
کووره‌یێ که له بەرهەمهێنانی پولادا بەکاردێترێ ◌ بسمر کانورتر
**Bessemer process** *noun*
پرۆسه یان شێوازی بێسێمێر (له بەرهەمهێنانی پولادا، بنەڕەت: له لایەن ئەندازیاری ئینگلیسی سێر Henry Bessemer) ◌ فرایند بسمر
**best** /best/ *adjective, adverb, noun*
*adj* باشترین، زۆرترین، لە هەموو زۆرتر، هەرەباش، چاکترین، لە هەموو چاتر، لە هەموو باشتر، لە هەموو زۆرتر، زۆرتر، باشتر، چاکتر، ـترین *adv* باشتر، چاکتر، چاتر، زۆرتر، پتر، زیاتر، زۆرینە، پرانی *n* باشترین کار یان شت، باشترین بەش، بە باشترین شێوە، باشترین بارودۆخ، باشترین جلوبەرگ، چاترین بەرگ ◌ *adj* بهترین، بهینه، بیشترین، بهتر از همه، بیشتر از همه، ـترین *adv* بهتر، بیشتر، حداکثر *n* بهترین کار یا چیز، بهترین وضع، به بهترین وجه، بهترین لباس
**bestial** /'bestiəl, US 'bestʃəl/ *adjective*
1 گیانەوەری، ئاژەڵی، هۆڤ، درندە، بێبەزەیی، گیانەوەرخوو، وەکوو حەیوان: *bestial acts/cruelty* 2 بێبەزەییانە، دڵڕەقانە، نامرۆڤانە ◌ (bestially /'bestiəli, US 'bestʃəli/ *adv*) 1 حیوانی، سبع، وحشی 2 بی‌رحمانه
**bestiality** /ˌbesti'æləti, US ˌbestʃi-/ *noun, pl.* bestialities
1 گیانەوەرخوویی، درندایەتی، هۆڤیگەری، دڵڕەقی، بێبەزەییەتی: *the sheer bestiality of these crimes* 2 نزیکی لەگەڵ گیانەوەران، گیانەوەربازی ◌ 1 حیوان‌صفتی، ددمنشی، سبعیت 2 وطی بهائم
**bestiary** /'bestɪəri, US -eri/ *noun, pl.* bestiaries
ئاژەڵنامە: چیرۆکی گیانەوەران یان گیانلەبەرەکان (سەربە سەدەکانی نێوەڕاست) ◌ قصص حیوانات
**best man** *noun*
برازاوا، شۆشبان، برازافا ◌ ساقدوش
**bestowal** *noun*
بەخشین، پێدان، پێشکەشکردن ◌ اعطا
**bestridden** = past participle of bestride
**bestrode** = past of bestride
**best-seller** /ˌbest'selə(r)/ *noun*
زۆرفرۆشراوترین (ب.ت. کتێب) ◌ پرفروش‌ترین
**best-selling** *adjective*
پڕفرۆش، زۆرفرۆشراو ◌ پرفروش
**bet**[1] /bet/ *noun*
1 گرێو، مەرجبەستن 2 پارەی گرێو ◌ 1 شرطبندی 2 وجه شرطبندی
**bet**[2] /bet/ = past and past participle of bet
**beta** /'biːtə, US 'beɪtə/ *noun*
بێتا، بیتا (β, B) دووەمین پیتی ئەلفوبێی ئینگلیسی) ◌ بتا
**beta blocker** *noun*
بێتا بلوکێر: دەرمانێ بۆ کۆنترۆڵکردنی لێدانی دڵ و چارەسەرکردنی ئێشی سنگ و کەمکردنەوەی پەستانی یا گوشاری خوێن ◌ بتا بلوکر
**beta carotene** *noun*
بێتا کارۆتین: ئیزۆمێریکی کارۆتین که له سەوزە و میوەی زەردی تۆند و سەوزی تۆخ یان تاریکدا دۆزراوەتەوە ◌ بتا کاروتن
**beta cell** *noun*
خانەی بێتا: خانەی دورگەکانی لانگێرهانز islets of Langerhans کە کارەکەی دەردان و بەرهەمهێنانی ئینسولین insulin ـە ◌ سلول بتا
**beta decacy** *noun*
لێکهەڵوەشان یان لێکبوونەوەی بێتا ◌ واپاشی بتا
**beta-endorphin** *noun*
ئێندرۆفینی رژێنەی pituitary کە توانایییەکی ژانبڕی یەکجار زۆرتری سەبارەت بە مۆرفین هەیە ◌ بتااندورفین
**beta globulin** *noun*
هەریەک لە چەند گلۆبۆلینی پلازما و serum ◌ گلوبولین بتا
**beta-glucan** *noun*
هەریەک لە polysaccharide ـەکان کە لە یەکەکانی گلۆکۆز پێکهاتوون و دەنکێکیان دەگرێتەوە کە لە دیوارەکانی خانەی endosperm ی دەغڵودانەدا (وەک جۆ و پەرشە) دۆزراوەتەوە ◌ گلوکان بتا
**betaine** /'biːtəiːn/ *noun*
(کیمیا) ئاوێتەیێکی کریستاڵی، لە زۆربەی شێلە و ئاوگی رووەکدا هەیە، جۆرێ ساتفتی alkaloid بلووری بێڕەنگ $C_5H_{11}NO_2$، لە چەوەندەری شەکر دەگیرێ یان لە glycine ساز دەکرێ و لە پزشکیدا بەکاردێترێ ◌ بتاین
**beta interferon** *noun*
ئێنتێرفێرۆنی بێتا: ئێنتێرفێرۆنێ کە ب.ت. لە لایەن fibroblast ـەکانەوە بەرهەم دێ (بڕوانە gamma interferon و alpha interferon) ◌ اینترفرون بتا
**beta iron** *noun*
ئاسنی بێتایی ◌ آهن بتایی
**beta lactamase** *noun*
بێتا لاکتاماز: هەوێنەیێ کە لە بەکتریای ستافیلوکوکی staphylococcal دا دۆزراوەتەوە

و پێنی‌سیلینه‌کان به‌هۆی هایدرۆلیزاندنیان له‌کار ده‌خا ◌ لاکتاماز بتا

**beta-oxidation** *noun*

بیتاــ ئۆکسـان(دن): کاتـابۆلیزمی بـه‌ره‌بـه‌ره‌ی ترشه‌لۆکه چه‌وره‌کان (یان چه‌وری‌یه‌کان) ◌ بتاـ اکسیداسیون

**beta particle** *noun*

(فیزیک) پارچۆلکه‌ی بیتا ◌ ذره‌ی بتا

**beta ray** *noun*

(فیزیک) تیشکی بیتا ◌ پرتو یا اشعه‌ی بتا

**beta rhythm** *noun*, also beta wave

(کارئه‌ندامناسی) ریتم و چالاکی یان ته‌وژمی ئێلیکتریکی ئاسایی مێشک (کاتێ هۆشیار و وریایه) به له‌ره‌ی frequency 13 تا 30 خول له هه‌ر چرکه‌یه‌کدا (وه‌رگێڕاوی ئه‌لمانی Betawellen بڕوانه alpha rhythm) ◌ نواخت بتا

**beta taxonomy** *noun*

پۆلاندنی بیتا ◌ رده‌بندی بتا

**beta test** *noun*

تاقی‌کردنه‌وه یا تازمایشتی بیتا (تاقی‌کاری‌یێکی سه‌ربه‌خۆی ده‌زگا و سافتویره‌کان که به‌رله له قۆناخه دوایی‌یه‌کانی پێ‌ره‌سه‌ندن ده‌کرێ (دوای تاقی‌کردنه‌وه‌ی ئالفا) ◌ تست بتا

**betatron** /'bi:tətrɒn/ *noun*

بیتاترۆن (ده‌زگایه‌که بۆ تاودانی ئێلیکترۆنه‌کان) ◌ بتاترون

**beta wave** *noun*

(فیزیک) شه‌پۆلی بیتا ◌ موج بتا

**betel** /'bi:tl/ *noun*

1 (رووه‌کناسی) بیتێل [*Piper betle*] 2 گه‌ڵای بیتێل ◌ تنبول

**Betelgeuse** *noun*

مالـه‌دووانـان، بێتێـل‌جـووز: ئـه‌سـتێره‌یێکـی supergiant سـووری بگـۆری magnitude یه‌کـه‌م نزیـک بـه شـانی رۆژهـه‌لاتی Orion (له عه‌ره‌بی *bayt al jawzā'* "the house of the twins") ◌ منکب‌الجوزاء، یدالجوزاء

**betel nut** = areca nut

**betel plan** *noun*

داری فه‌وفل ◌ درخت فوفل

**bête noire** /beɪt 'nwɑ:, bɛt, French bɛt nwaʀ/ *noun, pl.* bêtes noires /ˌbet 'nwɑ:(r)/

(فه‌ره‌نسی) مرۆ یان شتی لێ‌بێزراو یان ملۆزم، سه‌رودڵگر، له به‌رده‌ما شین‌بوو (بنه‌ره‌ت: واتای خۆی "گیانه‌وه‌ری ره‌ش") ◌ آدم یا چیز مورد تنفر

**beth** *noun*

بێت، بات: دووهه‌مین پیتی ئاوبێتی عیبری (واتا: ماڵ، "b, bh") ◌ بت

**bethel** *noun*

Gen. 28:19. sanctuary 1 شوێنێکی پیرۆز، 2 کلێسه یان جێ‌خه‌وی مه‌له‌وانان، شوێنێکی په‌رستن بۆ مه‌له‌وانان 3 نوێژگه یان کلێسه‌ی چکۆله بۆ نۆن‌کانفۆرمیسته‌کان (Bethel) شار یان گوندێ له رۆژاوای ئۆردۆن، نزیک به ئورشه‌لیم، ئێستا له که‌ناری رۆژاوا West Bank به ناوی بێتێن، له عیبری‌یه‌وه "ماڵی خودا") ◌ بتل

**Bethlem star** *noun*, also star-of-Bethlehem

(رووه‌کناسی) گێلاخه، سێ‌بکه، سێ‌بکۆله ◌ شیرمرغ

**betimes** *adverb*

(وێژه‌یی) به وه‌ختی خۆی، زوو، بێ‌درەنگ‌پێچوون ◌ زودهنگام

**bêtise** /beɪ'ti:z, bɛ'ti:z, French betiz/ *noun*

کار یان تێبینی بێ‌وه‌خت و گه‌وجانه ◌ بتیز

**betony** /'betəni/ *noun, pl.* betonies

1 جۆرێ رووه‌ک له تیره‌ی mint [ *Stachys officinalis*] 2 بۆ ناوی گیا و رووه‌کی تر به‌کاردێترێ، ب.ن. water betony ◌ نوعی گیاه

**betook** /bɪ'tʊk/ = past of betake

**betrayal** /bɪ'treɪəl/ *noun*

ناپاکی، خۆفرۆشی، خه‌یانه‌ت، له‌گیرخستن، به‌گیردان، له‌قاودان، راستی‌لێ‌وتن، گێڕانه‌وه ◌ خیانت، لودادن، افشا

**betrayer** *noun*

ناپاک، خایین، خه‌یانه‌تکار ◌ خائن

**betrothal** /bɪ'trəʊðl, US -'troʊ-/ *noun*

ده‌زگیرانی، ده‌سگیرانی، ده‌زوورانی ◌ نامزدی

**betrothed** /bɪ'trəʊðd, US -'troʊ-/ *adjective, noun*

ده‌زگیران، ده‌سگیران، ده‌زووران (پاگیره: کچی ده‌زگیراندار) ◌ نامزد

**betrothment** /bɪ'trəʊðmənt/ *noun*, also betrothal

ده‌زگیرانی، ده‌زوورانی ◌ نامزدی

**better**[1] /'betə(r)/ *adjective* (comparative of good), *adverb*

1 باش‌تر، چاتر، چاک‌تر، زۆرتر، زۆرینه‌ی، زۆربه‌ی، پتر، زیاتر، زێتر، گه‌وره‌تر: *We're hoping for better weather tomorrow* 2 (نه‌خۆشی) رووله‌چاکی، چاتر ◌ 1 بهتر، بیش‌تر، مهتر 2 رو به بهبودی

**better**[2] /'betə(r)/ *noun*

1 گرێوکار، گرێوباز، مه‌رجبه‌ست 2 (شت یان مرۆ) باشتر، چاکتر 3 سه‌رتری، به‌سه‌رداشکانه‌وه ◌ 1 شرط‌بند 2 (چیز یا آدم) بهتر 3 برتری

**better half** *noun*

(نافه‌رمی) هاوسه‌ر ◌ همسر

**betterment** /'betəmənt, US 'betərm-/ *noun*

1 باش‌تربوون، باش‌بوون، چاک‌بوونەوە، چابوونەوە، باش‌کردن، چاکردن، 2 (ماف) پەرەسەندن، چوونەسەرەوە: *His life offered me no improvement hope of betterment* ◌ 1 بهبود، اصلاح 2 ترقی

**betters** *noun, pl.*
گەورەترەکان، مەچیتران، گرنگ‌ترەکان، رۆشنبیرترەکان، دینادیتووەکان، تێگەیشتووترەکان ◌ بزرگ‌ترها، مهم‌ترها، فرهیخته‌ترها، فهمیده‌ترها

**betting** /ˈbetɪŋ/ *noun*
گرێو (کردن)، گرێوبازی، مەرجبەستن: *illegal betting* ◌ شرطبندی

**betting shop** *noun*
(لە بریتانیا) دووکانی گرێو، گرێوخانە ◌ مغازەی شرطبندی

**bettong** /ˈbɛtɒŋ/ *noun*
(گیانەوەرناسی) rat-kangaroo لووت‌پانی ئەوسترالیایی [توخمەکانی *Bettongia* و *Aepyprymnus*] (بنەڕەت: لە Dharuk وەرگیراوە) ◌ بتونگ

**bettor** /ˈbetə(r)/ *noun*, better
گرێوکەر، گرێوکار، گرێوباز، گرێوچی ◌ شرطبند

**between** /bɪˈtwiːn/ *preposition, adverb*
لەنێو، لەنێوان، نێوان، ناڤین، لە بەین، لە مابەین، لە نێوەڕاست، پێکەوە، لەگەڵ‌یەک: *Switzerland lies between France, Germany, Austria and Italy* ◊ *Don't eat between meals* ◌ بین، مابین، میان، متفقاً

**betwixt** /bɪˈtwɪkst/ *adverb, preposition,* betwixt and between
لە نێوەڕاست، لە نێوان، لە مابەین، لە بەین، نە ئەم و نە ئەو، لە ناوبەر، between ◌ در میان، حد وسط

**Beulah** *noun*
بیولا: 1 ژنی شووکردوو یان بەمێرد 2 (خوازە) وڵاتی ئیسرائیل Isa. 62:4 ◌ 1 بیولا 2 (مجازی) سرزمین اسرائیل

**beurre blanc** /bəː ˈblɒ̃, French bœʀ blɑ̃/ *noun*
جۆرێ سۆسی توێشکە، لە کەرە، پیواز، سرکە و ئاوی لیمۆ دەگیرێ (واتای خۆی: کەرەی سپی) ◌ نوعی سس

**beurre manié** /bəː ˈmanjeɪ, French bœʀ manje/ *noun*
جۆرێ تێکەڵەی ئارد و کەرە، بۆ خەستکردنەوەی سۆس یان سوپ (واتای خۆی: کەرەی لەکارکراو) ◌ بور مانیه

**bevel** /ˈbevl/ *adjective, noun*
1 لار، خوار، پەخ، ئاستی لاپێ، لێواری پەخ: *a bevel edge* 2 ئامێری پەخ‌کردن یان پەخاندن، پەخەک ◌ 1 مایل، پخ، لبەی پخ 2 ابزار پخ‌سازی

**bevel gear** *noun*
گێر یان دەندەی قووچەکی (یان قووچ) ◌ دندەی مخروطی

**bevelled** /ˈbevld/ *adjective*
لێوارلار، پەخ‌دار، پەخ، لێوارپەخ، خوار، لاپێ‌دار ◌ دارای لبەی پخ

**bevel square** *noun*
گۆنیا، گونیا ◌ گونیا

**beverage** /ˈbevərɪdʒ/ *noun*
(فەرمی) خواردنەوە (ب.ت. هەموو خواردنەوەیێ بێجگەلە ئاو) ◌ نوشیدنی

**bevvy** /ˈbɛvi/ *noun, pl.* bevvies
(نافەرمی، بریتانیا) خواردنەوەی ئەلکولی، ئارەق ◌ مشروب

**bevy** /ˈbevi/ *noun, pl.* bevies
گەل، دەستە، خێل، لەشکر، جەماعەت، کۆمەڵ، تاقم، پۆل (ب.ت. کەرەواڵە) ◌ گروه، گله، فوج

**bewhiskered** *adjective*
ریشی، ریشدار، بەریش ◌ ریش‌دار

**Bewick's swan** *noun*
جۆرێ باڵندەی رەگەزی ئوراسیایی قووی توندرا [*Cygnus columbianus bewickii*] tundra (بنەڕەت: لە ناوی هونەرمەند و هەڵکۆڵی ئینگلیسی Thomas Bewick (1753–1828)) ◌ نوعی پرنده

**bewigged** /bɪˈwɪɡd/ *adjective*
مووچاخ‌دار، بە زرپرچەوە، بە کلاوپرچەوە ◌ دارای کلاه‌گیس

**bewildered** *adjective*
گێژ، وڕ، کاس، سەرکوێر، پەشۆکاو، سەرسووڕماو، تاساو، بەگێروەستاو، شەرپلاندی ◌ گیج، شگفت‌زده

**bewildering** /bɪˈwɪldərɪŋ/ *adjective*
پەشۆکێنەر، سەرسووڕمێنەر، گێژکەر ◌ شگفت‌آور، گیج‌کننده

**bewilderment** /bɪˈwɪldəmənt, US -dərm-/ *noun*
وڕی، تاسان، پەشۆکان، سەرسووڕمان، شڵەژان، سەرسامی، مۆلەکە، confusion: *to look/stare in bewilderment* ◌ حیرت، بهت

**bewitched** *adjective*
جادووبەند، تەلەسمبەند، تەلەسمکراو، تەلەسماوی ◌ افسون‌شده

**bewitching** /bɪˈwɪtʃɪŋ/ *adjective*
دڵڕفێن، تەلەسماوی، سەرنج‌ڕاکێش، جادوویی، سێحراوی، هەڵفریوێنەر: *a bewitching girl* ◊ *a bewitching performance* ◌ مسحورکننده، جذاب

**bewitchingly** /bɪˈwɪtʃɪŋli/ *adverb*

دڵڕفێنانە، بە شێوەیەکی تەلەسماوی ۞ بە طور محورکننده

**bewitchment** /bɪˈwɪtʃmənt/ *noun*

سێحر، جادوو ۞ سحر

**bey** /beɪ/ *noun, pl.* beys

(مێژوویی) بێی، بەگ، ستانەوانی ناوچە یان هەرێمێ ۞ بیک

**beyond** /bɪˈjɒnd, US bɪˈjɑːnd/ *adverb, preposition*

1 دوورتر، لەوبەر، ئەوبەری، لەوپەڕ، ئەولاتر، ئەوبەرتر، درەنگ‌تر لە، دوای، پاش، لە پشت، لە پشتەوە، نە لەنێو چوارچێوەی، زۆرتر، زیاتر: *The road continues beyond the village up into the hills ◊ It won't go on beyond midnight ◊ Our success was far beyond what we thought possible* 2 سەروونر، سەرتر، لەژوور، لەبان، لەسەر 3 لە تێگەیشتن‌نایێ، سەرتر لە تێگەیشتن 4 بێجگەلە، جگەلە ۞ 1 آن سوی، آن طرف‌تر، دیرتر از، بعد از 2 فراسوی، فراتر از 3 خارج از فهم 4 به جز

**the beyond** /bɪˈjɒnd, US bɪˈjɑːnd/ *noun*

ئەو دنیا، ئەو جیهان ۞ آن جهان

**bezant** /ˈbɛz(ə)nt/ *noun*

1 (مێژوویی) کۆینی زێڕین یان زیوین لە بنەڕەتا لە بیزانتیوم لێدەدرا 2 (بیناسازی) ڕیزەبازنۆکە، زنجیرەپوولەکە، پوولەکەڕیز (بنەڕەت: لە *bezant* فەرەنسی کۆن، لە *Byzantius* لاتین "بیزانتین "Byzantine") ۞ بیزانت

**bezel** /ˈbɛz(ə)l/ *noun*

1 بازنە چالایی بۆ ڕاگرتنی شووشەی سەعات و هتد، جێ‌شووشە 2 پەخ، لارایی، ڕووێکی خوار، ئاستی لار 3 نقێم‌دان، جێ‌نقێم ۞ 1 بزل 2 پخ 3 نگین‌دان

**bezique** /bəˈziːk/ *noun*

بیزیک (- جۆرێ پەڕێن؛ ڕەنگە لە *bāzīgar* یان *bāzī* فارسی‌یەوە وەرگیرابێ) ۞ بیزیک

**bezoar** /ˈbiːzɔː , US ˈbɛzəʊɑː/ *noun*

1 سەنگزاوەر، سەنگا، بەردی دژی ژار 2 (گیانەوەرناسی) (bezoar-stone) جۆرێ بزنەکێوی شاخ شێوە scimitar، سەرڕەچەڵەکی بزنی ئێستا [*Capra aegagrus*] (بنەڕەت: لە *bezoard* فەرەنسی، لەسەر بنچینەی *bāzahr* عەرەبی، لە *pādzahr* فارسی "antidote") ۞ 1 پادزهر 2 بزوار

**BFPO** *abbreviation* British Forces Post Office

نووسینگەی پۆستی هێزە (چەکدارە)کانی بریتانیا ۞ بی‌اف‌پی‌ا

**Bh** *abbreviation* bohrium

**Bhagwan** /bʌgˈwɑːn/ *noun*

خوا، خوداوەند (بنەڕەت: لە *bhagwān* هیندی‌یەوە) ۞ خداوند

**bhajan** /ˈbʌdʒ(ə)n/ *noun*

(هیندوئیزم) گۆرانی دینی (بنەڕەت: لە *bhajana* سانسکریت) ۞ آواز مذهبی

**bhaji** /ˈbɑːdʒi/ *noun,* also bhajia, *pl.* bhajis, bhajia

(لە ئاشپەزی هیندی‌دا) کەیکی پانی چکۆلە یان کفتەی سەوزی، لە نێو کەرەدا سوور دەکرێتەوە ۞ باجی

**bhang** /bæŋ/ *noun,* also bang

بەنگ (سڕکەرە) ۞ بنگ

**bhangra** /ˈbɑːŋgrə/ *noun*

جۆرێ موسیقای گەلی، لە نەریتەکانی خۆماڵی پەنجابی و موسیقای پاپی ڕۆژاوا پێکهاتووە (بنەڕەت: لە *bhāngrā* پەنجابی) ۞ بانگرا

**bharal** /ˈbʌr(ə)l/ *noun*

(هیندی) جۆرێ مەڕی کێوی هیمالایایی، شاخ بۆ پشتەوە چەماو و کەوڵ شین [*Pseudois nayaur*] ۞ بارال

**BHC** *abbreviation* benzene hexachloride

**bhindi** /ˈbɪndiː/ = okra

**Bhojpuri** /ˌbəʊdʒˈpʊəri/ *noun*

زمانێکی Bihari، ب.ت. لە ڕۆژاوای بیهار و ڕۆژهەلاتی Uttar Pradesh قسەی پێ‌دەکرێ ۞ بوجپوری

**B horizon** *noun,* also illuvial horizon or enriched horizon

ئاسۆی بی، توێ یان چینی مایەدار، چینی نائاومالکی، چینێکی گلی روو کە یەکسەر لەژێر A horizon دایە و کەرەسە و ماکی ئەندامی لێ بەدەس دێترێ ۞ افق بی، هوریزون بی

**Bhutanese** /ˌbuːtəˈniːz/ *noun, adjective*

*n* خەڵکی Bhutan، بوتانی، مەڵبەندێکی چکۆلانە لە داوێنەکانی هیمالایاوە *adj* سەربە بوتان یان خەڵکەکەی، بوتانی ۞ بوتانی

**Bi** symb. the chemical element bismuth

**bi-** /baɪ, (also bin- before a vowel)/ *prefix*

پێشگر: جووت، دوانە، لە دوولاوە، لە دوو بەر یان دیوەوە، هەردوو... جارێ، دووجار لە هەر... ، دوو—: *biathlon*، *bilateral*، *biconvex*، *bicentennial*، *biennial*؛ (کیمیا، لە ناوی ئاوێتەکان‌دا) دوو گەردیلە یان کۆمەڵی جۆرێکی تایبەتی تیایە: *bicarbonate* (بنەڕەت: لە لاتینەوە "doubly, having two"، پێوەندی بە -*di* یۆنانی‌یەوە هەیە "two") ۞ پیشوند: دوگانه، به دو سو، هر دو... یکبار، دوبار در هر... ، دو-

**bi** /bʌɪ/ = bisexual (informal)

**bialy** /bɪˈɑːli/ *noun, pl.* bialys

(لە ئەمریکا) بیالی: جۆرێ نان بابۆڵەیی یان ساندویچی بە پیوازی جنراو یان وردکراوەوە

(بنەڕەت: یەدی، لە *Białystok* شـارێکی پۆڵەند کە ئەو نانە لە بنەڕەتا لـەوێ دروسـت دەکـرا) ۞ نوعی نان، بیالی

**biangular** *adjective*
جووت‌گۆشە، دووگۆشە ۞ دو زاویه

**biannual** /baɪ'ænjuəl/ *adjective*
ساڵی دووجار، شەش‌مانگە، نیوساڵ، نیوساڵانە، هەر شەش مانگ جارێ، هەر ساڵ دووجار: *a biannual meeting* ۞ سالی دوبار

**biannually** /baɪ'ænjuəli/ *adverb*
لە ساڵدا دووجار ۞ در سال دوبار

**bias** /'baɪəs/ *noun*
1 دەمـــارگرژی، لایـــەنگری، ئـــاڵی‌گـــری، بەلاداکێشی، لاگیری، لاگرتن، یەک‌بەرایەتی 2 ویـــست، داشـــکانەوە، لاربوونـــەوە، ڕاکێـــشک، تێندینـــی، ئارەزوو 3 توانایی، ئامادەیی 4 لار، خوار، قیل‌وقاچ، چەپ‌وڕاست، کەش‌وتووش، قیچەڵفاچ ۞ 1 تعـصب، سـوگیری 2 گـرایش 3 استعداد 4 اریب

**bias binding** *noun*
باریکەی لار یان قیل‌وقاچ، شریتی لار یان خوار ۞ نوار اریب

**biased** /'baɪəst/ *adjective*
1 دەمـارگرژ، لارەوەبـوو، داشـکاو، لاگـر: *a biased jury/witness* 2 ئالی‌گرانە، لایـەن‌گرانـە، لاگیرانە ۞ 1 متعصب، متمایل 2 جانبدارانه

**bias-ply** = cross-ply

**biathlon** *noun*
دووملانێ ۞ بیاتلون

**biauricular** *adjective*, also biauriculate
دووگوێ، خاوەنی دوو گوێ ۞ دارای دو گوش

**biaxial** *adjective*
دووتـەوەر(ە)، جـووت‌تـەوەر، دووتـەوەری ۞ دارای دو محور، دو محوری

**biaxial crystal** *noun*
کریستاڵی دووتەوەری یان جووت‌تەوەر ۞ بلور دو محوری

**biaxiality** *noun*
دووتەوەریتی، دووتـەوەرەیی‌بوون ۞ حالـت دو محوری

**biaxially** *adverb*
دووتەوەری‌یانە، بە شێوەی دووتەوەرەیی ۞ بـه طور دو محوری

**bib** /bɪb/ *noun*
1 بەرسـینگ (منـاڵ)، بەرلیکـە 2 جـۆرێ ماسـی کەناری ئەورووپایی لە تیرەی *Trisopterus* [ cod *luscus*] ۞ 1 پیشبند 2 نوعی ماهی

**bibelot** /'bɪbələʊ/ *noun*
خـشڵ‌وزەمبـەری هـەرزان و کـەم‌نـرخ ۞ زینـت کم‌ارزش

**bible** /'baɪbl/ *noun*
قورئـان، ئینجیـل، کـتێبی پـیرۆز ۞ هـر یـک از کتاب‌های آسمانی

**Bible** /'baɪbl/ *noun*
کتێـب یـان پـەڕتووکی پـیرۆز (پـەیمانی کـۆن و نوێ یان تەورات و ئینجیـل)، تـەورات (بنـەڕەت: لـە *biblia (ta)* یۆنـانی "کتێبـەکـان" (the) books"، لـە *biblion* "کتێـب"، چکـۆلـەکراوی *byblos* "پاپیروس، کتێب"، لە *Byblos* "شـارێکی کۆنی فینیکیە کە لـەوێوە پاپیروس دەنێردرا بۆ دەرێ") ۞ کتاب مقدس، تورات

**Bible Belt** *noun*
پشتێنەی کتێبی پیرۆز ۞ بایبل بلت

**Bible-basher** *noun*, also Bible-thumper
لایـەنگـری یـەکجـار گـرژی بنـەمـاخوازی کریستانیەت ۞ بایبل باشر

**Bible-bashing** *noun*, also Bible-thumping
لایـەنگـریتی یـەکجـارگرژ لـە بنـەمـاخوازی کریـستانیەت ۞ بایبل باشر

**biblical** /'bɪblɪkl/ *adjective*
(سەربە) کتێبی پیرۆز ۞ (وابسته به) کتاب مقدس

**biblicism** *noun*
لایەنگری یان پێبەندی بـە دەقـاودەقیـەتی کـتێبی پیرۆز ۞ مکتب کتابی

**biblicist** *noun*
لایەنگر یا پێبەند بە دەقـاودەقیـەتی کـتێبی پیرۆز ۞ اهل مکتب کتاب

**biblio-** /'bɪbliəʊ, US -lioʊ/ *prefix*
پێـشگر: کتێـب، کـتێبی پـیرۆز، *bibliology*: *bibliophile* (بنـەڕەت: لـە *biblion* یۆنـانی‌یـەوە "book") ۞ پیشوند: کتاب، کتاب مقدس

**bibliofilm** = microfilm

**bibliographer** /-'ɒgrəfə(r), US -'ɑːg-/ *noun*
بیبلیۆگـرافێر، چاوگنامـەنووس، کتێـب‌نـاس ۞ کتاب‌شناس

**bibliographic** /-ə'grafɪk/ *adjective*, also bibliographical /ˌbɪbliə'græfɪkl/
سـەربە چاوگنامەنووسـی یـان کتێـب‌ناسـی ۞ کتاب‌شناختی

**bibliography** /ˌbɪbli'ɒgrəfi, US -'ɑːg-/ *noun*
چاوگنامە، بیبلیۆگرافی، کتێب‌ناسی ۞ کتاب‌شناسی

**biblioklept** /'bɪbliəklept/ *noun*
کتێب‌دز، دزی کتێب ۞ دزد کتاب

**bibliolatry** /ˌbɪbli'ɒlətri/ *noun*
پەرستنی کتێبی پیرۆز ۞ پرستش کتاب مقدس

**bibliomancy** /'bɪblimænsɪ/ *noun*
فاڵ‌گرتنەوە یان بەخت‌گرتنەوە بە کتێب، ب.ت. کتێبی پیرۆز ۞ تفأل یا استخاره به کتاب

**bibliomania** *noun*
شێتی کتێب، خولیای بێ‌ئەنداز یـان یـەکجـار (بـۆ

bibliomaniac or کۆکردنـەوە و بـوونی: (bibliomaniacal *n, adj*) ◌ بیبلیومانیا

**bibliometrics** *noun, pl.*
شی‌کردنەوەی سەرژمێری و ئاماری کتێبـەکان و بڵاوبووەکانی تر، کتێب‌پێوی ( bibliometric *adj*) ◌ بیبلیومتریک

**bibliopegy** *noun*
هونەری بەرگ‌تێگرتنی کتێب، جزوبەند ◌ فـن تجلید کتاب

**bibliophile** /ˈbɪbliəfaɪl/ *noun*
کتێب‌دۆست، خولیای کتێب، کتێب‌خۆشەویست، کتێب‌کۆکەرەوە ◌ کتاب‌دوست، جمع‌کننده‌ی کتاب

**bibliophily** /-ˈɒfɪli/ *noun*
کتێـب‌دۆسـتی، کتێـب‌خۆشەویـسـتی، کتێب‌کۆکردنەوە ◌ کتاب‌دوستی، گردآوری کتاب

**bibliopole** /ˈbɪblɪə(ʊ)pəʊl/ *noun*
(کـۆن) فرۆشـیاری کـتـێبی کـۆن و دەگمـەن ◌ بیبلیوپول

**bibliopolist** = bibliopole

**bibliotheca** /ˌbɪbli:əˈθi:kə/ *noun*
لیـستەی کتێبەکان ◌ فهرست کتاب‌ها

**bib overalls** = dungarees

**bibulous** /ˈbɪbjʊləs/ *adjective*
1 ئارەق‌خۆر، مەی‌خۆرەوە 2 شێگر، مژۆک ◌ 1 میگسار 2 جاذب، نم‌گیر

**bibulousness** /ˈbɪbjʊləsnəs/ *noun*
1 ئارەق‌خۆری، مەی‌خۆری 2 شێگری، مژۆکی ◌ 1 میگساری 2 نم‌گیری

**bicameral** /ˌbaɪˈkæmərəl/ *adjective*
دووئەنجومەنە (وەکوو House of Senate و House of Representatives لە ئەمریکا و House of Lords و Commons لە بریتانیا؛ bicameralism *n*: دووئەنجومەنی) ◌ دارای دو مجلس

**bicameral legislature** *noun*
(سیـستەم) قـانوونـدانـانی دووئەنجومەنـە ◌ قانون‌گذاری دومجلسی

**bicarb** /ˈbaɪkɑ:b, US -kɑ:rb/ = sodium bicarbonate

**bicarbonate** /ˌbaɪˈkɑ:bənət, US -ˈkɑ:rb-/ *noun*
دووکاربۆنـات، دوانۆکاربۆنـات، بیکاربۆنـات، بایکاربۆنات 1 (کیمیا) خوێیێ کە ئانیۆنی $HCO_3$ تیایە 2 سۆدیۆمی دووکاربۆنات ◌ بیکربنات

**bicarbonate of soda** = sodium bicarbonate

**bice** /bʌɪs/ *noun*
رەنگی شین یان سەوزی شین ◌ رنگ آبی یا سبز آبی

**bicellular** *adjective*
(زیندەناسی) دووخانەیی، جووت‌خانەیی ◌ دارای دو یاخته

**bicentenary** /ˌbaɪsenˈti:nəri, US -ˈten-/ *noun, pl.* bicentenaries
دووسـەد ساڵـە، دووسـەدەمین سـاڵ، ئاهـەنگی دووسەد ساڵە، bicentennial ◌ دویـسـت‌سـاله، جشن دویست‌ساله

**bicentennial** /ˌbaɪsenˈteniəl/ *adjective, noun*
*n* هـەر دووسـەد سـاڵ جـارێ *adj* (سـەربە) دووسـەدەمین سـاڵ، دووسـەدەمین سـاڵ‌وەگـەڕ، (ئاهەنگی) دووسەدەمین ساڵ ◌ *n* هر دویـسـت سـال یـک‌بـار *adj* (وابـسـتـه بـه) دویـسـت‌سـاله، دویستمین سالگرد

**bicentric** *adjective*
دووناوەندی، جووت‌نێوەند ◌ دارای دو مرکز

**bicephalic** *adjective,* also bicephalous /bʌɪˈsɛf(ə)ləs, US -ˈkɛf-/
دووسەرە، دووسەر ◌ دارای دو سر

**biceps** /ˈbaɪseps/ *noun, pl.* same
ماسـوولکەی دووسـەر، (biceps brachii) دووسەرەماسوولکە (وەک هی پێشەوەی بازوولە یان قۆڵ)؛ (هـەروەهـا leg biceps یان biceps femoris) ماسوولکەی دووسەری پشتەوەی ران ◌ عضله‌ی دوسر

**bichir** /ˈbɪʃɪə/ *noun*
جـۆرێ ماسـی درێـژی ئـەفریکایی [تـوخم Polypterus] ◌ نوعی ماهی

**bichloride** *noun*
(کیمیا) دووکلۆراید، دوانۆکلۆراید، بیکلۆراید ◌ بیکلورايد

**bichon frise** /bi:ʃ(ə)n ˈfri:z/ *noun*
جۆرێ رەگەزی سەگی چکۆلەی تووکسپی فر ◌ بیشون فریز

**bichromate** *noun*
دووکـرۆمات، دووکرۆمـەیـت، بـای‌کرۆمـات، بای‌کرۆمەیت ◌ بیکرومات

**bicipital** *adjective*
دووسـەر، دووسـەرە، سـەربە biceps ◌ دارای دوسر، وابسته به عضله‌ی دوسر

**bickering** *noun*
شەڕەدەنووک، مشت‌ومڕ، شەڕوکێشە، دەمەقرە، حەمەرەحەمزێ ◌ یکی‌به‌دو، کلنجار، جروبحث

**bickerer** *noun*
مشت‌ومڕباز، ئەهلی مشـت‌ومڕ ◌ اهل جروبحث

**bicky** /ˈbɪki/ *noun,* also bikky, *pl.* bickies
(نافەرمی) تۆشە، غوڕابی، بیسکویت ◌ بیـسکویت

**bicolour** *adjective, noun,* US bicolor, also bicoloured
*adj* دووڕەنگ، دووڕەنگە *n* گوڵ یان رەگەزی دووڕەنگ ◌ *adj* دارای دو رنگ *n* گـل یـا نـژاد

دورنگ

**biconcave** /'baɪ'kɒnkeɪv/ *adjective*
دوولاچـــــاڵ، دوولاقوپـــــاو، دوولاڕۆچـــــوو (biconcavity *n*) ۞ مقعرالطرفین

**biconvex** /ˌbaɪ'kɒnkeks/ *adjective*
دوولاقـۆقز، دوولادەرپـەڕیو (biconvexity *n*) ۞ محدب‌الطرفین

**bicorn** /'baɪkɔːn/ *adjective*, also bicornous /'baɪkɔːnəs/
جووت‌شاخ، دووشاخە، دووشاخ، دووشـاخە ۞ دارای دوشاخ

**bicultural** *adjective*
دووفەرهەنگە، دووچاندە، خاوەن یان لێکدراو لە چاند و فـەرهـەنـگ و نـەریـتی دوو نـەتـەوە یـا کۆمــەڵــی ڕەگــەزی (biculturalism *n*) ۞ دوفرهنگە

**bicuspid** /baɪ'kʌspɪd/ *adjective, noun*
*adj* دووچوکـــلە *n* ددانی دووچوکـــلە ۞ *adj* دوپایە *n* دندان دوپایە

**bicycle** /'baɪsɪkl/ *noun*
دووچەرخە، چەرخ، ئەسپەدارینە ۞ دوچرخە

**bicycle clip** *noun*
گیرە یان پووزەوانەی دووچەرخە (لەبەر ئـەوەی نەکەوێتە بەر زنجیر) ۞ گیرەی دوچرخە

**bicycle lane** = cycle lane

**bicyclic** /bʌɪ'sʌɪklɪk, US -'sɪk-/ *adjective*
(کیمیا) دووئالقەیی، جووت‌ئالقەیی، دووبازنـەیی ۞ دوحلقه‌ای

**bicyclist** /'baɪsɪklɪst/ *noun*
چەرخ‌سوار، دووچەرخەسوار ۞ دوچرخه‌سوار

**bid**[1] /bɪd/ *noun*
1 پێشنیار، پێشنیاز (بـە مەبەسـتی کـڕین یـان هـەراج auction) 2 هـەوڵ، تێکۆشـان، بـزاف 3 بڕەپارەی پێشنیارکراو ۞ 1 پیشنهاد 2 تـلاش، کوشش 3 مبلغ پیشنهادشده

**bid**[2] /bɪd/ = past and past participle of bid

**biddability** /-'bɪlɪti/ *noun*
گوێڕایەڵـی، ملکـەچی، قـسەبیـسی، ئـارامی ۞ اطاعت، حرف‌شنوی

**biddable** /'bɪdəbl/ *adjective*
گوێڕایـەڵ، ملکـەچ، قـسەبیس، حاڵـی، ئـارام ۞ مطیع، حرف‌شنو

**bidden** /'bɪdn/ = past participle of bid

**bidder** /'bɪdə(r)/ *noun*
پێشنیاردەر، پێشنیارچی، پێشنیازکار، پێشنیاردەر، پێشنیازدەر (لە مەزات یا هەراجدا) ۞ پیشنهاددهنده

**bidding** /'bɪdɪŋ/ *noun*
1 دەستوور، فەروار، فەرمان 2 پێشنیار، پێشنیاز 3 خوێندنەوە (بەڕێن) ۞ 1 دستور، امر 2 پیشنهاد 3 خواندن

**bidental** /baɪdəntl/ *adjective*, also bidentate /baɪdənteɪt/
دووددانە ۞ دودندانه

**bidet** /'biːdeɪ, US bɪ'deɪ/ *noun*
(فەڕەنسی) بیدەی، بیدێ (تەشتێکی پەل بۆ تیاشتنی ئەندامە سێکسی‌یەکان و سمت) ۞ بیده

**bidi** /'biːdiː/ *noun*, also beedi or biri, *pl.* bidis
(لـە نیمچەوشـکاری هێنـد) جـۆرێ جگـەرەی هەرزان ۞ بیدی

**bidirectional** *adjective*
دوولایی، دوولایەنی، لە دوو لاوە کار دەکا ۞ دوجهتی

**bidri** /'bɪdri/ *noun*
داڕشتەی مس، سورب یان قوڕقوشم، قالایی و زینک ۞ بیدری

**biennial** /baɪ'eniəl/ *adjective, noun*
1 *adj* دووساڵە، دووساڵانە، هەردوو ساڵ جارێ 2 دووساڵـەژی، دووساڵــە (ڕوانــە annual، perennial) *n* ڕووەکــی دووسـاڵـــە یـــان دووساڵـەژی ۞ 1 *adj* دوساله، هردو سال یک‌بار 2 *n* دوساله گیاه دوساله

**biennium** /bʌɪ'ɛnɪəm/ *noun, pl.* biennia /-nɪə/ or bienniums
ماوە یان قۆناخی دووساڵە ۞ دورەی دوساله

**bien pensant** /ˌbjã pɒ̃'sɒ̃, French bjɛ̃ pɑ̃sɑ̃/ *adjective*
تێگەیشتوو، ڕاست‌بیرکەرەوە، ژیـر ۞ فهـیم، درست‌اندیش

**bier** /bɪə(r), US bɪr/ *noun*
(مێز) دووداره، دارتەرم ۞ تابوت

**bifacial** /baɪ'feɪʃəl/ *adjective*
دووڕوویــــی، دووڕووەکـــــی (bifacially /baɪ'feɪʃəli/ *adv*) ۞ دوجهی

**biff** *noun*
(نافەرمی) مشت، مست، لێدان ۞ مشت، ضربه

**bifid** /'bʌɪfɪd/ *adjective*
(ڕووەکناســـی، گیانەوەرناســـی) دووفلیقانــــە، داتلیشاو ۞ شکافته

**bifilar** /bʌɪ'fʌɪlə/ *adjective*
دووتاڵی، دووڕیشاڵی، دوودەزوویی، دووسیمی: *bifilar suspension of a pendulum* (bifilarly /bʌɪ'fʌɪləli/ *adv*) ۞ (دارای) دورشته

**biflagellate** *adjective*
دووشیلاق(ـه)، جـووت‌شـیلاقه: *biflagellate gametes* ۞ دارا دو تاژک

**bifocal** /baɪ'feʊkl/ *adjective, noun*
*adj* دووتیـشکۆ، جـووت‌تیـشکۆ *n* (bifocals /ˌbaɪ'fəʊklz, US -'foʊ-/) چاویلکـــەی دووتیشکۆ یا جـووت‌تیـشکۆ ۞ *adj* دوکانونـه *n* عینک دوکانونه

**biforked** *adjective*
دوولق، دووفلیقانە، دووحاچە ◌ دوشاخە

**biform** *adjective*
دووبیچمە، جووت‌شێوە، دووشێوە ◌ دوریختە

**bifurcate** /bʌɪˈfəːkət/ *adjective*
1 دوولـق، داتلیـشاو، داقلیـشاو، لـک‌لـک، دووفلیقانـە، دوولقانـە، دووپـەل 2 لـق‌وپـۆدار، بەپەل‌وپۆ، پرلق‌وپۆ ◌ 1 دوشاخە 2 شاخەدار

**bifurcation** /ˌbaɪfəˈkeɪʃn, US -fərˈk-/ *noun*
لق‌کران، دوولق‌بوون، بوونەدووحاچە، لێ‌بوونەوە، داتلیشان، داقلیشان، دووفلیقان، دووپەل‌بوون ◌ دوشاخەشدگی

**big** /bɪg/ *adjective* (bigger, biggest)
1 گـەورە، زل، کـەڵـنگ، فیلەتـەن، کەتـە، گـەپ، درشـت، زۆپ، گاشـە، زەلام، زلـە: *a big* 2 *my big brother* ◊ *man/house/increase* تونـد، بـەهێز، بەقـەوەت: *a big storm* 3 بـەرز، بەرجەسـتە 4 گرنـگ، بەرکـەفتی، سـەرەکی، *a* :preeminent ،chief ،serious ،important *the big issue of the* ◊ *big decision* 5 *campaign* بـەربلاو، بـەرین، بەرفرەهـ زۆر، زەبـەن: *big government* 6 دەس‌ڕۆیـشتوو، بـەناوبانگ، ناسـراو 7 سـکپڕ، ئـاوس، دووگیـان، pregnant (*adj* biggish: کـەمێ گـەورە، تـا ئەندازەیێ گـەورە؛ *n* /bɪgnəs/ bigness) ◌ 1 بزرگ، گنده 2 شدید، ستبر 3 عالی 4 مهم، اصلی 5 وسیع، گسترده، انبوه 6 معروف 7 باردار، آبستن

**bigamy** /ˈbɪgəmi/ *noun*
دووهاوسـەری، دووژنی، دوومێـردی، دووژن‌ومێـردی (*n* /ˈbɪgəmɪst/ bigamist: دووهاوسـەری، ژنی دوومێـردە، مێـردی دووژنـە؛ *adj* /ˈbɪgəməs/ bigamous: دووهاوسـەر، دووژنە، دوومێردە، دووژن‌ومێردە: *a bigamous relationship*؛ بنەڕەت: لە *bigamie* فەڕەنسی کـۆن، لـە *bigame* ،"bigamous" لـە *bigamus* Late Latin لە *-bi* "دووجـار" + *gamos-* یۆنـانی "زەماوەندکردوو") ◌ دوهمسری

**the Big Apple** *noun*
(نافەرمی) شاری نیویۆرک ◌ نیویورک

**big band** *noun*
گـەورەتیپی موسـیقاژەنان (جـاز یـان موسـیقای هەڵپەڕکێ) ◌ بیگ‌باند

**big bang** *noun*
(ئەسـتێرەوانی) گەورەتەقینـەوە، تەقینـەوەی گـەورە: تـەقینـەوەیێکـی خێـرای گـەردوونی کـە بـەپێـی تیـۆرییـە گـەردووناسـییـەکـانی cosmological theories ئێستا بنەڕەتی جیهان یان گەردوونی دارشتووە ◌ انفجار بزرگ

**big bang theory** *noun*
تیـۆری تەقینـەوەی گـەورە: تیـۆرییێکـی ئەستێرەوانی کە پێی وایە جیهان بە میلیاردها سـاڵ لـەوە پـێش لـە تـەقینـەوەیێکدا لـە تاکـە خاڵێکی چڕی density وزەی energy دیاری‌نە کراوەوە پێکهاتووە ◌ نظریەی انفجار بزرگ

**Big Brother** *noun*
بـرای گـەورە (دیکتـاتۆر یـان هێزەکـانی حکومـەتێکی تۆتـالیتێری کـە هـەموو لایـەنێکی ژیانی خەڵک کۆنترۆڵ دەکەن و لە کاتێکیش‌دا خۆیان بە دڵسۆز پیشان دەدەن) ◌ برادر ارشد

**big business** *noun*
1 گەورە کومپانیا یان تێوکۆیی‌یەکان 2 بازرگانی لە ئاستێکی زۆر بەربلاودا ◌ 1 شرکت‌های عظیم 2 تجارت کلان

**Big C** (Slang) noun = cancer

**big cat** *noun*
پشیلەی گەورە (ئاماژە بە شێر، پڵنگ، بەوور و هتد) ◌ گربەی بزرگ

**big cheese** *noun*
(نافەرمی) سەرفیل، کەسێکی گرنگ ◌ کلەگندە

**big crunch** *noun*
(ئەستێرەوانی) وردبوونی گـەورە، دژی the big bang ◌ بیگ کرانچ

**big dipper** *noun*
شەمەندەفەر یان ترێنی زوورەو (یان خێرارەو، لە پارک) ◌ ترن هوایی

**the Big Dipper** *noun*
1 (بریتانیا) the Plough = 2 roller coaster (حەوتەمین ئەستێرەی سەرەکی لە گەلەستێرەی Ursa Major) ◌ بیگ دیپر

**big end** *noun*
(میکانیک)سەری شاتون، سەرشاتۆن ◌ سر شاتون

**bigeminal** *adjective*
(تویکـاری) دووانـە، جـووت، جـووتی (*n* bigeminay) ◌ دوتائی، زوجی

**bigeneric** /ˌbʌɪdʒɪˈnɛrɪk/ *adjective*
(ڕووەکناسی) سەربە شتێکی دوورەگە لە دوو توخم یان دوورەگەز، دووتوخمی، ڕوورەگەزی: *a bigeneric hybrid* ◌ بیجنریک، دوجنسی

**bigeye** *noun*
چاوزلـە 1 (جـۆرێ tuna ی کۆچـەری زلـە [*Thunnus obesus*]) 2 جـۆرێ ماسـی مەیلەوسووری چاوزل، هی گەرمێنانی ئەتلانتیک و ڕۆژاوای ئۆقیانووسـی هێنـد [ *Priacanthus arenatus*] ◌ نوعی ماهی

**big fish** *noun*
مرۆی دەس‌ڕۆیشتوو ◌ آدم متنفذ

**Bigfoot** *noun, pl.* Bigfeet
پـازل: گیانەوەرێکی قژنی زلـەی مـەیموون‌ئاسا ◌ بیگ‌فوت

**big game** *noun*
1 (ڕاو) گیانـەوە گـەورەکان یـان زلـەکان 2

سینەما ۞ سینما

**big shot** *noun,* also big noise
مرۆی دەس‌رۆیشتوو ۞ آدم متنفذ

**the big stick** *noun*
(سیاسەت) هەرەشە بۆ سەنگی خستنەسەر، رامیاری یان سیاسەتی تێلا (بنەڕەت: ئەم فریزە لە لایەن تیۆدۆر رۆزفێلت Theodore Roosevelt بیست و شەشەمین سەرۆک کۆماری ئەمریکا (1919–1858) باوی پەیدا کرد، دەیگوت دەبێ ئەمریکا بە نەرمی بدوێ و بە زەبری تێلا و کونەک بجوولێتەوە) ۞ بیگ ستیک، سیاست زور یا اعمال فشار

**big-ticket** *adjective*
(نافەرمی) زۆرتێچوو، گرانبایی، بەنرخ ۞ پرهزینه، باارزش

**the big time** *noun*
1 سەرکەوتنی گەورە، لووتکەی سەرکەوتن 2 ئەوپەڕی ناسراوی ۞ 1 موفقیت بزرگ 2 اوج معروفیت یا موفقیت

**big-time** *noun*
بەناوبانگ، بەناو، نێوبەدەرەوە، ناسراو ۞ معروف، پرآوازه

**big toe** *noun*
قامکە گەورە (پێ)، قامکەکەلە ۞ شست پا

**big top** *noun*
خێوەت یان چادری سیرک، گەورەخێوەت ۞ چادر سیرک

**big wheel** *noun*
1 (نافەرمی و لە ئەمریکا (ی باکووری) کەسێکی گرنگ یان دەس‌رۆیشتوو 2 سارسارۆک، چەرخ‌وفەلەک ۞ 1 آدم متنفذ 2 چرخ‌وفلک

**bigwig** /ˈbɪgwɪg/ *noun*
(نافەرمی) کەسێکی گرنگ یان دەس‌رۆیشتوو ۞ آدم متنفذ

**Bihari** /bɪˈhɑːri/ *adjective, noun*
*adj* سەربە بیهار، بیهاری، خەڵکەکەی یان زمانەکەیان *n* دانیشتووی رەسەنی هەرێمی بیهار لە رۆژهەڵاتی باکووری هیند، کۆمەڵێ لەو سێ زمانە زۆر لێک‌نزیکانەی کە زۆرتر لە بیهار قسەی پێ‌دەکرێ ۞ بیهاری

**bijou** /ˈbiːʒuː/ *noun, adjective*
(*pl.* bijoux pronunc. same) *n* گەوهەر، خشڵ‌وزەمبەری هەرزان *adj* گردوکۆ، قوتو، دەسنە، چکۆلە و خۆش (خانوو و باخچە) ۞ *n* جواهر، زیورآلات کم‌ارزش *adj* کوچک و جذاب، نقلی

**bijouterie** /biːˈʒuːt(ə)ri, French biʒutʀi/ *noun*
خشڵ‌وزەمبەری هەرزان، خشڵ و گەوهەر ۞ زیورآلات کم‌ارزش، جواهرات

**bike** /baɪk/ *noun*

مەبەست یان ئامانجی گەورە ۞ 1 (شکار) حیوانات بزرگ 2 هدف عظیم

**biggie** /ˈbɪgi/ *noun*
شت، مرۆڤ یان رووداوێکی گرنگ ۞ بیگی

**big gun** *noun*
(نافەرمی) مرۆی بەهێز یان بەقەوەت، کەرقەوە ۞ آدم قوی، خرزور

**bigha** /ˈbiːgə/ *noun*
(لە نیمچەوشکاری هیند) پێوەرێکی زەوی‌وزار بە چەند ئەندازەی خوجێیی لە 1/3 تا یەک acre (1/8 تا 2/5 هێکتار) ۞ بیگا

**big hand** *noun*
میلی گەورە (سەعات) ۞ عقربەی بزرگ

**bighead** *noun*
1 سەرەماسێ: چەندین نەخۆشی گیانەوەران کە لەودا سەریان دەماسێ 2 (نافەرمی) مرۆی لەخۆبایی، بنیادەمی خۆبەزلزان (bigheaded *adj*: خۆبەزلزان، لەخۆبایی، بەدەمار، لەخۆرازی، کەلەگوربە؛ bigheadedness *n*) ۞ 1 بیگ‌هد 2 آدم مغرور

**big-hearted** *adjective*
دڵ‌گەورە، بەبەزەیی، دڵۆڤان ۞ مهربان، نظربلند

**bighorn** *noun, pl.* same or bighorns
شاخ‌زلە (جۆرێ مەڕی کێوی شاخ‌زل، لە چیاکانی راکی دەبینرێ [*Ovis canadensis*]) ۞ بیگهورن

**bight** /baɪt/ *noun*
1 ئاڵقەی تەناف، گرێ لە گوریس و تەنافدا 2 پێچ 3 کەوانە یان چەماوەی کەنار 4 کەنداو ۞ 1 گره طناب 2 پیچ 3 قوسی ساحل 4 خلیج

**big league** *noun, adjective* = major league (big leaguer)

**big money** *noun*
کۆماپارە، لۆدەپارە، کۆڵێ پوول ۞ پول هنگفت

**big mouth** *noun*
(نافەرمی) کەسێکی دەم‌شڕ یان دەم‌پیس (big-mouthed *adj*: دەم‌گەورە، دەم‌زل) ۞ آدم دهن‌کج

**big name** *noun*
کەسێکی بەناوبانگ، بنیادەمی ناوبەدەرەوە، کەسێکی بەنامیە ۞ آدم معروف

**big noise** *noun*
کەسێکی دەس‌رۆیشتوو ۞ آدم متنفذ

**bigot** /ˈbɪgət/ *noun*
دەمارگرژ، پاشبڕۆ، کۆنەپەرست (bigoted /ˈbɪgətɪd/ *adj*: بیرتەسک، دەمارگرژ، بیرکۆن، کۆنەپەرست، چەق‌بەستوو؛ bigotry /ˈbɪgətri/ *n* (*pl.* bigotries): دەمارگرژی، سەخت‌گیری، بیرکۆنی، کۆنەپەرستی، چەق‌بەستوویی، فەرەنسە "bigot hypocrite") ۞ مرتجع، متعصب

**the big screen** *noun*

:biker /'baɪkə(r)/ *n* (نافـەرمی) چـەرخ (چەرخ‌سوار) ◌ دوچرخه
**biking** *noun*
چەرخ‌سـواری ◌ دوچرخەسواری
**bikini** /bɪ'ki:ni/ *noun*
جلەمەلێی دووتیکە (هی ژنان) ◌ بیکینی
**bikky** = bicky
**bilabial** /ˌbaɪ'leɪbiəl/ *adjective, noun*, also bilabiate /baɪ'leɪbɪeɪt/
(زمانەوانی) دوولێوی (ب.ت. *w*، *m*، *b* و *p*) ◌ دولبی
**bilateral** /ˌbaɪ'lætərəl/ *adjective*
1 دوولایەنـه، دوونـالی، دووقۆڵـی، دووسـەرە، بەرامبەر: *bilateral relations/agreement* 2 دووبەشە ◌ 1 دوطرفه. دوسویه 2 دوقسمتی
**bilaterally** /ˌbaɪ'lætərəli/ *adverb*
دوولایەنانە، لە دوولاوە، لە دووسەرەوە ◌ بـه طور دوسویه
**bilayer** *noun, adjective*
دووتوێ: توێ یان پەردەیێ membrane بە دوو توێی گەردیـیەوە molecular layers: - *a layer of phospholipid molecules* ◌ دولایه
**bilberry** /'bɪlbəri, US -beri/ *noun, pl.* bilberries
1 دەوەنی قەرەقات یا قەرەگەیلان [ *Vaccinium myrtilus* و جۆرەکانی تر] 2 بەری خۆراکی قەرەقات ◌ 1 قرەقاط 2 ثمره قرەقاط
**bilbo** *noun, pl.* bilbos or bilboes
(مێژوویی) جـۆرێ شمـشێر (لەبـەر چۆنیـەتی تیخەکەی؛ بنەرەت: لە *Bilboa* ناوی بەندەرێکی سپانیا کە تیخی چاکی دەسازاند) ◌ نوعی شمشیر
**bilboes** *noun, pl.*
کۆت‌وزنجیر، پێوەند ◌ کنده
**bilby** /'bɪlbi/ *noun, pl.* bilbies
bandicootی ئەوسـترالیایی رەهـۆڵێنـدەر یـان رەهـۆڵ‌کـەنی burrowing گوێدرێـژ [تـوخم Macrotis: دوو جۆرن] ◌ بیلبی
**bile** /baɪl/ *noun*
زەرداو، زراو، زراڤک، کرانتی ◌ صفرا، زرداب
**bile duct** *noun*
داکت یان جۆگە یـان کانالـی زەرداو، زەرداوڕێ ◌ مجرای صفرا
**bilestone** *noun*
بەردی زراو یان زەرداو ◌ سنگ صفرا
**bi-level** *adjective*
دوونوێـڵی، جـووت‌ن(و)یـلی، دوولۆسـەیی ◌ دواهرمی
**bilge** /bɪldʒ/ *noun*
1 بنەکەشتی، تـەرکی کەشـتی، تـەختی کەشـتی، گـەن(ـد)او یـان نـاوی بنەکەشـتی (لـە بـن یـان تـەرکی کەشـتی کۆبۆتـەوە) 2 زگ یـان تەنگـەی کۆس 3 قسـەی هەڵیت‌وپلیت ◌ 1 خن، آب خن 2 شکم بشکه 3 شروور
**bilge water** *noun*
ئاوی تەرکی کەشتی، گەناو، ئاوی بنەکەشتی ◌ آب خن
**bilharzia** /bɪl'hɑ:tsiə, US -'hɑ:rt-/ *noun*, also bilharziasis /ˌbɪlhɑ:'tsʌɪəsɪs/
نەخۆشی‌یەکی سەختە، لە چەند بەشێکی ئەفریکا و ئـەمریکای باشـووری، لـە ئـەنجامی کرمێکـی چکۆلەوە کە دەچێتە نـاو خوێنـەوە (بنـەڕەت: لـە نـاوی پزشـکی ئـەڵمانی Theodor *Bilharz*، مەرگ 1862) ◌ بیلهارزیا
**bilharzial** *adjective*
سەربە بیلهارزیا ◌ وابسته به بیلهارزیا
**biliary** /'bɪlɪəri/ *adjective*
(پزشکی) سەربە bile یان bile duct ◌ وابسته به صفرا یا مجرای صفرا
**bilinear** *adjective*
1 دوولایـی، دوولایەنـه 2 بـه دوو هێـڵی ڕاستەوخۆوە، دووهێڵە ◌ 1 دوسویه 2 دارای دو خط مستقیم
**bilingual** /ˌbaɪ'lɪŋgwəl/ *adjective, noun*
*adj* دووزمانـه *n* مـرۆی دووزمـانزان ◌ *adj* دوزبانه *n* شخص دوزباندان
**bilingualism** *noun*, also bilinguality
دووزمانی ◌ دوزبانی
**bilious** /'bɪliəs/ *adjective*
1 زراودار، توش‌بوو بە زەرداو (بەهۆی بەدکاری جگـەر و ب.ت. dysfunction دەردانی زۆری زەرداو) 2 هەڵـتوزین، بەدخولـک، جینگـزی، بەدخوو 3 سەربە زراو 4 زەردرەنگ 5 بێزەون، قێزەون، ڕشێنەرەوە: *I felt a little bilious after last night's dinner* ◌ 1 مبتلا به صفرا 2 کج‌خلق 3 وابسته به صفرا 4 زردرنگ 5 مهوع
**biliously** /'bɪliəsli/ *adverb*
بەدخولکانە، جینگزی‌یانە، بەدخووانە ◌ بـا کج‌خلقی
**biliousness** /'bɪliəsnəs/ *noun*
بەدخوویی، بەدخولکی، ڕووناخۆشی ◌ کج‌خلقی
**biliteral** /baɪ'ɪtərəl/ *adjective*
دووپیتە، دووتیپی ◌ دوحرفی
**Bill** *noun* (the Bill or the Old Bill)
پۆلیس ◌ پلیس
**bill**[1] /bɪl/ *noun*
1 لیـست، ریـزک، فـاکتۆر، لیـستە 2 پۆسـتێر، پلاکارد، بەرنامە 3 ئاگاداری، سەرنجە، تێبینی، دانەزانین، هایداری، جـار، بـلاوک، داخویـانی 4 بـەرنووس، پـێشنـووس: *to introduce/approve/reject a bill* ◊ *the Education Reform Bill* 5 پارەی کـاغزی 6 بیل (بەرات، سفته یان حەوالـه) 7 دەستوورنامە،

بروانامە ۞ 1 صورت‌حساب، فاکتور 2 پوستر، پلاکارد، برنامە 4 اعلان، آگهی 5 لایحە 6 اسکناس 7 برات، حوالە، سفتە 8 گواهی، پروانە

**bill**[2] /bɪl/ *noun*

1 دەنووک، نوکل، شەند 2 لمۆزی platypus 3 نووکی قوولایی لەنگەر 4 لووتکە، سەر: Portland Bill 5 (لە لێکدانا، ناوەڵناوەکان - billed): long-billed waders ۞ 1 منقار 2 پوزەی پلاتیپوس 3 بیل 4 دماغە

**bill**[3] /bɪl/ *noun*

جۆرێ چەکی سەدەکانی نێوەڕاست لە تەورزین دەچوو، لە جیاتی تیخ قوولایی هەبوو (ئەڵمانی بنەڕەت) ۞ بیل

**billboard** /ˈbɪlbɔːd, US -bɔːrd/ *noun*

تەختە ئاگاداری ۞ تابلوی اعلانات

**billet**[1] /ˈbɪlɪt/ *noun*

1 خانووی کاتی (بۆ سەربازەکان)، شوێنی گیرسانەوە 2 کار، ئیش ۞ 1 مسکن موقت 2 شغل

**billet**[2] /ˈbɪlɪt/ *noun*

1 ئێزنگ، کۆماموورە، بەرەدار 2 قورسە، کەستەک، دارشتە 3 (بیناسازی) زنجیرەلوولەک یان کوتەرەئاسا کە دەخرایە شوێنێکەوە (لە نەخشی رازاندنەوەی نۆرمانەکاندا) ۞ 1 هیزم 2 شمش 3 بیلت

**billet-doux** /ˌbɪleɪ ˈduː/ *noun*. *pl.* billets-doux /-ˈduːz/

(فەرەنسی) نامەی دڵدارانە ۞ نامەی عاشقانە

**billfish** *noun, pl.* same or billfishes

دەنووکەماسی، ماسیی دەنووکە (marlin، sailfish، spearfish و ماسی وا [خێزان Istiophoridae]) ۞ نوعی ماهی

**billfold** /ˈbɪlfəʊld, US -foʊld/ = wallet

**billhook** /ˈbɪlhʊk/ *noun*

داسخالە، کێردی باخەوانی، داسک ۞ داسغالە

**billiards** /ˈbɪliədz, US ˈbɪljərdz/ *noun, pl.*

بیلیارد ۞ بیلیارد

**billiard table** *noun*

مێزی بیلیارد ۞ میز بیلیارد

**Billings method** *noun*

شێوەیێکی دۆزینەوەی کاتی هێلکۆکەدانان بەهۆی تاقیکردنەوەی لینجی ملی منداڵدان (وەک شێوەی سروشتی بۆ مەهار و کۆنترۆڵی منداڵبوون یان زاوزێ، لە ناوی Drs John و Evelyn *Billings* کە ئەم شێوەیان داهێنا) ۞ روش بیلینگس

**billion** /ˈbɪljən/ cardinal number *noun*

1 بیلیۆن، میلیارد، هەزار میلیۆن $10^9$، (لە بریتانیا) تریلیۆن، یەک میلیۆن میلیۆن $10^{12}$؛ 2 (billions، نافەرمی) ژمارە یان بڕێکی یەکجار زۆر ۞ 1 بیلیون، تریلیون 2 (در جمع) تعداد یا مقدار خیلی زیاد

**billionth** ordinal number *adjective*

بیلیۆنەمین، بیلیۆنەم ۞ بیلیونمین

**billionaire** /ˌbɪljəˈneə(r), US -ˈner/ *noun*

بیلیاردێر، میلیاردێر: *a Texas billionaire* ۞ میلیاردر

**bill of entry** *noun*

(لە گومرکدا) لیستی ئەو کەلوپەلەی کەوا هاتوتە ژوورەوە ۞ فهرست کالاهای ورودی

**bill of exchange** *noun, pl.* bills of exchange

بەرات (بۆ کەسێکی تایبەتی و لە کاتێکی دیاریکراویشدا) ۞ برات

**bill of fare** *noun, pl.* bills of fare

لیستەی خۆراک، بەرنامە، خۆراکنامە، مێنۆ ۞ صورت غذا

**bill of health** *noun*

دەستوورنامەی سلامەتی یان تەندروستی (هی کارکەرانی کەشتی) ۞ پروانەی بهداشت

**bill of lading** *noun, pl.* bills of lading

بارنامە (کەشتی) ۞ بارنامە

**bill of quantities** *noun*

لیستی لێکدانەوە ۞ صورت برآورد

**bill of rights** *noun*

1 مافەکانی هاووڵاتییان 2 پەیمانی مافەکان، پەیمانی مافە بنچینەیییەکانی مرۆڤ ۞ 1 حقوق شهروندان 2 منشور حقوق شهروندان

**bill of sale** *noun, pl.* bills of sale

قەباڵەی (فەرمی) فرۆشتن، بەڵگەی فەرمی فرۆشتن ۞ سند انتقال مالکیت

**billon** /ˈbɪlən/ *noun*

دارشتەیێ کە جاران بۆ لێدانی سکە بەکاردێنرا و بریتی بوو لە زێڕ یان زیو و مس و کانزایی هەرزانبایی تر ۞ بیلون

**billow** /ˈbɪləʊ, US -loʊ/ *noun*

1 شەپۆل، لێپاو، پێل 2 تۆپەڵە، بارستایی، بارستە: *A farmer was burning straw, the yellow billows of smoke spiralling lazily upward* ۞ 1 موج 2 تودە

**billowy** *adjective*

شەپۆلاوی ۞ متلاطم

**billposter** /ˈbɪlpəʊstə(r)/ *noun*, also billsricker /ˈbɪlstɪkə(r)/

ئاگاداریلکێن، ئاگاداریێوەنەر، ئاگاداریچەسپێن ۞ آگهی‌چسبان

**billposting** *noun*

ئاگاداریلکێنی، ئاگاداریێوەنان، ئاگاداریچەسپێنی ۞ آگهی‌چسبانی

**billy**[1] /ˈbɪli/ *noun*, also billycan /ˈbɪlikæn/

قابلەمە، بەرۆش ۞ قابلمە

**billy**[2] /ˈbɪli/ *noun* , also billy club, = truncheon

**billycart** *noun*

1 (ئەوسترالیا) دەستەبەر یان فەرغوونی چکۆلە go-cart = 2 ◌ چرخ دستی کوچک
**billycock** *noun*
(مێژوویی) جۆری bowler hat ◌ نوعی کلاه لگنی
**billy-goat** *noun*
بزنەنێر، نێری، تەگە، سابرین، سابرین، کەلێز ◌ بز نر
**billy-oh** /'bɪliəʊ, US -oʊ/ *noun*, also billy-o, like billy-o
بە توندی، توند، بە خێرایی ◌ به شدت
**bilobed** *adjective*, also bilobate
دووپل، جووتپل ◌ دارای دو قطعه
**bilocation** *noun*
دووشوێنی (دیاردەیێکی خەیالی کە پێت وایە لە کاتێکدا لە دوو شوێن یان جێگای) ◌ بیلوکاسیون
**biltong** /'bɪltɒŋ, 'bəl-, US -tɑːŋ, -tɔːŋ/ *noun*
گۆشتی لەبەر خۆر وشکەوەکراو (لە باشووری ئەفریکا) ◌ بیلتانگ
**bimane** /'baɪmeɪn/ *noun*
گیانەوەر یان ئاژەڵی دوودەست ◌ جانور دودست
**bimanous** /baɪ'meɪnəs/ *adjective*
دوودەستە، دوودەست ( bimanously /baɪ'meɪnəsli/ *adv*) ◌ دودست
**bimanual** *adjective*
دوودەستی، بە هەر دوو دەست جێبەجێ دەبێ ◌ دودستی
**bimanually** *adverb*
دوودەستی‌یانە، بە شێوەیێکی دوودەستی ◌ به طور دودستی
**bimbo** *noun, pl.* bimbos
(نافەرمی، سووکانە) ژنی جەوانی سەرنجڕاکێش بەڵام دەبەنگ ◌ زن جوان جذاب اما کودن
**bimester** *noun*
دوو مانگ، ماوەی دوومانگ ◌ دوماه، مدت دو ماه
**bimestrial** *adjective*
دوومانگە، هەردوو مانگ جاری ◌ دوماهه، هر دو ماه یک بار
**bimetal** *noun*
بی‌مێتال، تێمپراچێری دووکانزایی ◌ بی‌متال
**bimetallic** *adjective, noun*
1 دووکانزایی، جووتکانزایی 2 (مێژوویی) سەربە bimetallism ◌ دوفلزی
**bimetallic strip** /ˌbaɪmətælɪk 'strɪp/ *noun*
باریکەی دووکانزایی ◌ نوار دوفلزی
**bimetallism** /baɪ'met(ə)lɪz(ə)m/ *noun*
سیستم یان ڕێکخستەی دووکانزایی، بیمێتالیزم (سیستمی بەکارهێنانی زێڕ و زیو بۆ یەکەی پارەی وڵاتێ) ◌ بیمتالیسم
**bimillenary** /ˌbʌɪmɪ'lɛnəri, -'liːn-, bʌɪ'mɪlənəri/ *adjective, noun* (*pl.* bimillenaries)
*n* سەربە ماوەی دوو هەزارساڵە یان دوو هەزارەمین ساڵوەگەڕ *adj* ماوە یان ساڵوەگەڕی دووهەزار ساڵە ◌ (دوره یا سالگرد) دوهزار ساله
**bimolecular** *adjective*
دووگەردی، جووتگەردی، دوومۆلۆکولی ◌ دومولکولی
**bimolecular reaction** *noun*
(کیمیا) کاردانەوەی دووگەردی ◌ واکنش دومولکولی
**bimonthly** /ˌbaɪ'mʌnθli/ *adjective, adverb*
هەر دوو مانگ جارێ، دوومانگ بە دوومانگ، هەر دوو حەوتوو جارێ، دووجار لە مانگدا، مانگی دووجار ◌ هر دو ماه یکبار، ماهی دوبار
**bimorphemic** *adjective*
دووشێوەیی، دووبیچمی ◌ دوریختی
**bin** /bɪn/ *noun*
1 تەنەکەی خۆڵ و خاک 2 قوتوو، سنووق(چە)، سیپ، کەندوو، کەنوو (گڵێنە، بنەڕەت سێلتی) ◌ 1 سطل آشغال 2 صندوقچه، جعبه
**bin-** variant form of bi- before a vowel *prefix*
پێشگر: دوو، دووانە، جووت ◌ پیشوند: دوگانه
**binary** /'baɪnəri/ *adjective, noun* (*pl.* binaries)
*adj* دوودانەیی، دووانەیی، جووتی، دو(و)انی: *binary code/numbers* ◊ *binary arithmetic*
*n* (ئەستێرەوانی) کۆمەڵەیێکی دوو ئەستێرەیی کە بە دەور ناوەندێکی هاوبەشدا دەسووڕێنەوە ◌ *adj* دوتایی، مضاعف *n* بیناری
**binary compound** *noun*
(کیمیا) ئاوێتەی دوانی ◌ ترکیب دوتایی
**binary digit** *noun*
ڕەنووس یان ژمارەی دوانی یان جووتی ◌ رقم دودویی
**binary notation system** *noun*
سیستمی ژمارەکانی جووتی یان ڕەنووسە جووتی‌یەکان ◌ دستگاه اعداد دودویی
**binary star** *noun*
(ئەستێرەوانی) جووتەئەستێرە، ئەستێرەی دوانی یا جووت ◌ ستارەی دوتایی
**binary system** *noun*
(ئەستێرەوانی) کۆمەڵەی دووهەسارەیی ◌ منظومەی دوسیارەای
**binational** *adjective*
سەربە دوو نەتەوە، دوونەتەوەیی ◌ وابسته به دو ملت

**binaural** /bɪˈnɔːr(ə)l, US bʌɪ-/ *adjective*
دووگوێیی، هەردوو گوێ دەگرێتەوە ◌ شامل هر دو گوش

**bind** /baɪnd/ *noun*
1 بەند، پێوەندی، تێکەڵی 2 کێشە، گیچەڵ، جەنجاڵی، دەردیسەری 3 بارودۆخی ئاڵۆز 4 (موسیقا) = 5 tie وشەیێکی تر بۆ bine ◌ 1 قید، علاقه 2 مخمصه 3 وضعیت بغرنج

**binder** /ˈbaɪndə(r)/ *noun*
1 جزوبەندکار، جزوبەندچی، شیرازەبەند، بەرگتێگر 2 کلاسۆر، بەست 3 لاویردە؟، چەقچەقە ◌ 1 صحاف 2 کلاسور، بند 3 بیندر

**bindery** /ˈbaɪndərɪ/ *noun, pl.* binderies
(کارگا) جزوبەند یان بەرگتێگری، شیرازەبەندی ◌ صحافی

**biner** = karabiner

**bindi** /ˈbɪndiː/ *noun, pl.* bindis
نیشانەی جوانی ناوچاوانی ژنانی هیندی ◌ بیندی

**bindi-eye** /ˈbɪndɪʌɪ/ *noun*
جۆرێ گیای چکۆلەی چەندساڵەی ئەوسترالیایی، لە تیرەی daisy، بەرەکەی پێکۆڵئاسایە [*Calotis cuneifolia*] ◌ نوعی گیاه

**binding** /ˈbaɪndɪŋ/ *noun, adjective*
*n* 1 بەرگ، بەرگتێگری، جزوبەند 2 شیرازە، تیزماڵک، باریکە *adj* 1 تەوزیمی، زۆرەملی، ناچاری: *The decision is binding on both parties* ◊ *a binding agreement/contract* ◊ *a binding promise* (bindingly *adv*) (bindingness *n*) ◌ *n* 1 جلد، صحافی 2 سجاف *adj* الزام‌آور

**Binding theory** = government binding theory

**bindlestiff** /ˈbɪnd(ə)lstɪf/ = tramp (US)

**bindweed** /ˈbaɪndwiːd/ *noun*
پەرپەرۆک، لاولاوەی باخی، مالۆنچە، مالوێنچە، مالویچە [*Convolvulus* و تۆخمەکانی تر، زۆر جۆرن] ◌ نیلوفر پیچ

**bine** /bʌɪn/ *noun*
تەرز، لاسکی نەرمی هەڵچوو ◌ پیچک

**Binet-Simon scale** *noun*
تاقیکاری هۆشی بۆ تەمەنەکانی سێ‌ساڵان و دوازدە ساڵان و هتد (لە لایەن Alfred *Binet* و Théodore *Simon*، دوو دەروونناسی فەرەنسی) ◌ نوعی تست

**bing** *noun*
(لە سکاتلەند) کۆما بەردی کان یان پاشەڕۆکی کانێ ◌ بینگ

**binge** /bɪndʒ/ *noun.* go on a binge
1 زۆرخواردنەوە، تا قورقوراچکە خواردنەوە: 2 *One of the symptoms is binge eating* دەسبڵاوی، عەبلەخەرجی، هەڵەخەرجی ◌ 1 افراط در مشروب‌خواری 2 ولخرجی

**bingo** /ˈbɪŋgəʊ, US -goʊ/ *noun, pl.* bingos
بینگۆ (= جۆرێ قومار) ◌ بینگو

**bin-liner** *noun*
توورەکە یا دەلقی نێو تەنەکەی خۆڵ و خاک ◌ کیسەی داخل سطل آشغالی

**binman** /ˈbɪnmæn/, *pl.* binmen = dustman

**binnacle** /ˈbɪnək(ə)l/ *noun*
پایە یان جێگەی ڕووگەدۆز، سنووقی لادۆز یان کۆمپاس (نامەگناتیسی، لەسەر کەشتی) ◌ پایەی قطب‌نما

**binocular** /bɪˈnɒkjələ(r), US bɪˈnɑːkjələr/ *adjective*
(تکنیکی) دووچاوی، دووچاوە، جووت چاوی، هەر دوو چاو دەگرێتەوە، بەکارهێنانی هەر دوو چاو لە کاتێکدا ◌ دوچشمی، استفاده از چشم در آن واحد

**binoculars** /bɪˈnɒkjələz, US bɪˈnɑːkjələrz/ *noun. pl.*
دووربینی دووچاوی یان دووچاوە ◌ دوربین دوچشمی

**binocular telescope** *noun*
دووربین یان تەلەسکۆپی دووچاوی یان دووچاوە ◌ تلسکوپ دوچشمی

**binocular vision** *noun*
بینینی دووچاوی یان بە دووچاو، دیتنی دووچاوی، دیتنێ کە هەر دوو چاو دەگرێتەوە ◌ دید دوچشمی

**binomial** /baɪˈnəʊmɪəl, US -ˈnoʊ-/ *noun, adjective*
*n* 1 (بیرکاری، جەبر) دووکەرتە، جووت‌کەرت(ە)، باینۆمیاڵ (وەک 3 x + 2 y و 4 x - 2 x) 2 ناوی جۆرێکی بایۆلۆژیکی کە لە دوو کەرت یان بەش پێکهاتووە *adj* دووناوە، خاوەنی دوو نێو، جووت‌نێوە (بنەڕەت: لە لاتین *binomium*، لە -*bi* "خاوەنی دوو" + یۆنانی *nomos* "کەرت، بەش" + (al-) ◌ *n* 1 دوجمله‌ای 2 بینومیال، دونامی *adj* دارای دو نام

**binomial coefficient** *noun*
هاوکۆلکەی دووکەرتی یان جووت‌کەرت(ە)، بەپێی هاوکێشەی دووکەرتەیی) ◌ ضریب دوجمله‌ای

**binomial distribution** *noun*
بڵاوبوونەوەی دووکەرتی یان دووبەشی: جۆرێ سەرژمێری کە لەودا شوێنە جیاوازەکان و شێوەی بڵاوبوونەوەی خەڵک و ژمارەیان لەبەرچاو دەگرێ و بە هێنانی شیمانە و ئەگەرەکان تێکڕای گشتی حەشیمەت لێک دەداتەوە ◌ دیستریبیوشن بینومینال

**binomial nomenclature** *noun*
ناونانی دووناوی یان دووکەرتی یان دووبەشی:

جۆرێ شێواز و سیستمی ناونانی زیندەناسی‌یە کە لەودا هەر گیانەوەر یان رووەکێ دوو ناوی هەیە، یەکەمیان هی توخم genus و دووهەمیان هی جۆریەتی species ۞ نومنکلاتور بینومینال

**binomial theorem** *noun*

هاوکێشەی دووکەرت(ـە)یی ۞ معادلەی دوجملەای

**binominal** *noun*

وشەیێکی تر بۆ binomial (واتای دوو) ۞ واژەای دیگر برای binomial2

**bint** /bɪnt/ *adjective*

(تافەرمی، سووکانە) کچ یان ژن ۞ (عامیانە) دختر یا زن

**binturong** /ˈbɪntjʊrɒŋ/ *noun*

(مالیزیایی) جۆرێ civetی دارنشینی ئاسیایی کەوڵڕەش و کلک ماسوولکەیی بگیر [*Arctictis binturong*] ۞ بینتورونگ

**binuclear** *adjective*

(خانەیێ) دوونێوکی، دووناوکە، جووت‌ناوکی، دووکرۆکە ۞ دوهستەای

**binucleate(d)** /bʌɪˈnjuːklɪət/ = binuclear

**bio** *noun, adjective*

biological *adj* biography 2 biology 1 *n*

**bio-** /ˈbaɪəʊ, US ˈbaɪoʊ/ *prefix*

پێشگر: ژیان، ژی، ژین، زیندە (بنەڕەت: لە *bios* یۆنانی‌یەوە "human life"، لە بواری زانستدا بەربڵاو بۆتەوە و ژیانی ئەندامی "organic life" دادەگرێ) ۞ پیشوند: زی، زیست

**bioaccumulation** *noun*

کۆبوونەوەی ماکێ لەنێو لەشی شتە زیندووەکاندا ۞ زیست‌انباشتی

**bioacoustician** *noun*

زیندەدەنگ‌ناس، شارەزای زیندەدەنگ‌ناسی ۞ بیواکوستیسین

**bioacoustics** *noun, pl.*

زیندەدەنگ‌ناسی: لقێ لە زانست کە لەمەڕ دەرچوونی دەنگ بەهۆی زیندەوەرەکان و کاریگەری لەسەر ئەوان (زیندەوەرەکان) دەکۆڵێتەوە، لێکۆڵینەوەی پێوەندی نێوان گیانەوەران و دەنگەکان ۞ بیواکوستیک

**bioactive** *adjective*

زیندەچالاک: (لەبارەی ماکێکەوە) خاوەنی کاریگەری زیندەناسی‌یانە یان بیۆلۆژیکی، کاریگەری لەسەر زیندەوەرێ هەیە ۞ بیواکتیو

**bioactivity** *noun*

زیندەچالاکی، چالاکی زیندەیی یان بایۆلۆژیکی ۞ بیواکتیویتی

**bioassay** /ˌbʌɪəʊəˈseɪ/ *noun*

هەڵسەنگاندن یا تاقی‌کردنەوەی بایۆلۆژیکی یا زیندەیی: دیاری‌کردنی چالاکی یان توانایی بایۆلۆژیکی ماکێ وەک ڤیتامین یان هۆرمۆن، بە تاقی‌کردنەوە یان ئازمایشتی کاریگەری لەسەر هەڵدانی زیندەوەرێ ۞ بیوآسای، مقایسە یا آزمون زیستی

**biocatalyst** *noun*

زیندەهاندەر، بایۆکاتالیست ۞ بیوکاتالیست

**biocenosis** = US spelling of biocoenosis

**biocentric** *adjective*

زینده(وەر)تەوەر، زینده(وەر)ناوەند، بایۆسێنتریک ۞ زیست‌محور

**biocentrism** *noun*

زیندە(وەر)تەوەری، زیندە(وەر)ناوەندی: بۆچوون یان باوەڕێ کە پێی وایە ماف و پێداویستی‌یەکانی مرۆڤ گرنگ‌تر لە زیندەوەر و بوونەوەرەکانی تر نییە ۞ زیست‌محوری

**biochemical** /ˌbaɪəʊˈkemɪkl, US ˌbaɪoʊ-/ *adjective*

زیندەکیمیایی، بایۆکێمیکاڵ، بایۆکیمیایی ۞ زیست‌شیمیایی

**biochemically** /ˌbaɪəʊˈkemɪkli, US ˌbaɪoʊ-/ *adverb*

لەباری زیندەکیمیایی یا بایۆکیمیایی‌یەوە ۞ از لحاظ زیست‌شیمیایی

**biochemist** /ˌbaɪəʊˈkemɪst, US ˌbaɪoʊ-/ *noun*

بایۆکیمیست، زیندەکیمیازان، پسپۆڕی زیندەکیمیا ۞ زیست‌شیمیدان

**biochemistry** /ˌbaɪəʊˈkemɪstri, US ˌbaɪoʊ-/ *noun*

زینده(وەر)کیمیا، بایۆکیمیا، کیمیای زیندەوەری: 1 کیمیایێ لە لەمەڕ ئاوێتە و رەوت و پرۆسە کیمیایی‌یەکان دەکۆڵێتەوە؛ توێژینەوە یان لێکۆڵینەوەی زانستی‌یانەی کیمیای شتە زیندووەکان 2 تایبەتمەندی یان کاردانەوە کیمیایی‌یەکانی زیندەوەر و ئۆرگانیزمێکی تایبەتی یان ماکێکی زیندەوەری یان بایۆلۆژیکی (وەک chlorophyll) ۞ زیست‌شیمی

**biochip** *noun*

زیندەتەلەزمە (بەشەکانی لە گەردە molecule ئەندامی، ماکە کیمیایی یان پێکهاتە بیۆلۆژیکی‌یەکان پێکهاتووە) ۞ بیوچیپ

**biochrome** *noun*

زیندەڕەنگ: هەر ڕەنگێکی گیایی یان گیانەوەری کە بە شێوەی سروشتی هەبێ ۞ بیوکروم

**biocidal** *adjective*

سەربە زیندەکوژی یان زیندەفەوتێنی ۞ وابستە به بیوساید

**biocide** *noun*

1 زیندەکوژ، زیندەفەوتێن 2 فەوتاندنی ژیان ۞ بیوساید

**bioclast** /ˈbʌɪə(ʊ)klast/ *noun*

(زەوی‌ناسی) زیندەکەرت: تیکە یان پارچەیێکی

لەیکە یان بووبەرد کە بەشێ لە تەختەبەردی rock نیشتوو پێکدێنێ ۞ بیوکلاست

**bioclastic** *adjective*

زیندەکەرتی، سەربە یان پێوەندی بە زیندەکەرت یان بیوکلاستەوە هەیە ۞ وابستە بە بیوکلاست

**bioclimatic** *adjective*

(ژینگەناسی) سەربە پێوەندی ئاووهەوا و چالاکی‌یەکان و بلاوبوونەوەی زیندەوەرەکان ۞ بیوکلیماتیک

**biocoenosis** /ˌbʌɪə(ʊ)sɪˈnəʊsɪs/ *noun, pl.* -oses /-siːz/, US biocenosis

(ژینگەناسی) بەشداری و پێوەندی زیندەوەرە جۆراوجۆرەکان کە کۆمەڵێکی یەکگرتووی لێکنزیک پێکدێنن، کۆمەڵگایێکی ئیکۆلۆژیکی ب.ت. یەکەیێکی خۆرێکخەر پێکدێنن ۞ بیوسینوسیس

**biocompatibility** *noun*

زیندەسازاوی، زیندەگونجاوی ۞ بیوکامپوتیبیلیتی

**biocompatible** *adjective*

زیان ناگەیێنی بە شانەی زیندوو، زیندەسازاو ۞ بیوکامپوتیبل

**biocomputer** *noun*

1 بایۆکامپیوتێر: کامپیوتێرێ لەسەر بنچینەی کۆمەڵە خولگە و بەشێ کە لە گەردە یان پێکهاتە بیۆلۆژیکی‌یەکان پێکهاتووە 2 مێشک، زیندەکامپیوتێر ۞ 1 بیوکامپیوتر 2 مغز

**biocontrol** = biological control

**bioconversion** *noun*

زیندەگۆڕی: گۆڕینی ماک و مەتریاڵە ئەندامی‌یەکان (وەک پاشەڕۆکان) بۆ سەرچاوەیێکی وزە (وەک مێتان) بەهۆی کۆمەڵە ڕەوت و پرۆسەیێکەوە (وەک ترشاندن) کە ئۆرگانیزمە زیندووەکان دەگرێتەوە ۞ بیوکانورسیون

**biocybernetics** = bionics

**biodate** *noun, pl.*

وردەکاری ژیاننامەیی ۞ جزئیات بیوگرافی

**biodegradability** /ˌbaɪəʊdɪˈgreɪdəˈbɪlətɪ, US ˌbaɪoʊ-/ *noun*

زیندەلێکهەڵوەشانهاتوویی، بایۆلێکهەڵوەشانهاتوویی ۞ زیست‌تجزیه‌پذیری

**biodegradable** /ˌbaɪəʊdɪˈgreɪdəbl, US ˌbaɪoʊ-/ *adjective*

زیندەلێکهەڵوەشانهاتوو، بایۆلێکهەڵوەشانهاتوو ۞ زیست‌تجزیه‌پذیر

**bio-diesel** *noun*

زیندەدیزێل، زیندەسووتەمەنی جێگرەوەی دیزێل، بایۆدیزێل ۞ بیودیزل

**biodiversity** /ˌbaɪəʊdaɪˈvɜːsətɪ, US ˌbaɪoʊdaɪˈvɜːrs-/ *noun,* also less frequent biological diˈversity

زیندەفرەجۆری، بایۆدیڤێرسیتی (بوونی ژمارەیەکی زۆری جۆرە جیاوازەکانی گیانەوەر و ڕووەک کە ژینگەیەکی هاوسەنگ پێکدێنن) ۞ زیست‌چندگونگی

**biodynamic** *adjective*

سەربە زیندەدینامیک ۞ زیست‌پویا

**biodynamics** *noun, pl.*

زیندەدینامیک: لێکۆڵینەوەی جووڵەی فیزیکی یان دینامیک لە سیستەم یان ڕێکخستە زیندووەکاندا، لقێ لە زیندەناسی کە لەمەڕ وزە یان چالاکی ئۆرگانیزمە زیندەوەکان دەکۆڵێتەوە ۞ زیست‌پویاشناسی

**bioelectric** *adjective*

سەربە ئێکلیتریسیتی یان ئەو دیاردە ئێلیکتریکی‌یەکانە کە لەنێو ئۆرگانیزمە زیندووەکان بەرهەم دێ ۞ بیوالکتریک

**bioelectricity** *noun*

بایۆئێکلیتریسیتی، زیندەئێلیکتریسیتە ۞ بیوالکتریسیتی

**bioelectronics** *noun, pl.*

بایۆئێکلیترۆنیک، زیندەئێلیکترۆنیک ۞ بیوالکترونیک

**bioenergetic** *adjective*

سەربە زیندەوزەناسی ۞ وابستە به بیوانرژتیک

**bioenergetics** *noun, pl.*

زیندەوزەناسی: لێکۆڵینەوەی ڕاگوێستنی وزە لە ئۆرگانیزمە زیندوونەکاندا، زیندەناسی ڕاگوێستن و ئاڵوگۆڕی وزە (وەک لە photosynthesis لەنێو و نێوان شتە زیندووەکان و ژینگە و دەوروبەریاندا ۞ بیوانرژتیک

**bioenergy** *noun*

زیندەوزە، بایۆئێنێرژی ۞ بیوانرژی

**bioengineering** *noun*

زیندەئەندازیاری: 1 بەکارهێنانی شانە یان ئەندامە دەسکردەکان لە لەشدا 2 بەکارهێنانی زانستی ئەندازیاری لە پزشکی و گیانەوەرناسیدا 3 = genetic engineering ۞ 1 مهندسی زیستی 2 بیوانجینرینگ

**bioethical** *adjective*

سەربە ئاکاری پزشکی و توێژینەوەی بایۆلۆژیکی ۞ وابسته به بیواتیک

**bioethics** *noun, pl.*

ئاکاری پزشکی و توێژینەوەی بایۆلۆژیکی ۞ بیواتیک

**bioflavonoid** *noun,* also vitamin P

بایۆفلاڤۆنۆید: هەریەک لەو کۆمەڵە ئاوێتانەی کە زۆرتر لە میوە لیموویی‌یەکان و لە هێندێ ڕووەکی تردا هەیە و جاروبار وەک ڤیتامین دادەنرێ، ڤیتامین P ۞ بیوفلاوونوید

**biofuel** *noun*

زیندەسووتەمەنی، زیندەوەرسووتەمەنی:

سووتەمەنی‌یێ کە راستەوخۆ لە ماکێکی زیندوو بەرهەم دێترێ ۞ زیست‌سوخت

**biogas** /ˈbaɪəʊgæs, US ˈbaɪoʊ-/ *noun*
زیندەگاز، زیندەوەرگاز، بایۆگاز ۞ زیست‌گاز

**biogenesis** /bʌɪə(ʊ)ˈdʒɛnɪsɪs/ *noun*
1 زیندەپێکهاتی، زیندەوەرپێکهاتی، پێکهاتنی ماک و مەتریالەکان لە لایەن زیندەوەرەکانەوە یان ئۆرگانیزمە زیندووەکانەوە 2 (مێژوویی) ئەو گریمانەیە کە ماکی زیندوو تەنیا لە ماکێکی زیندووی تر سەرهەڵدەدا ۞ بیوژنیز

**biogenetic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە biogenesis ـەوە هەیە ۞ وابستە بە بیوژنیز یا بیوجنسیس

**biogenic** /ˌbʌɪə(ʊ)ˈdʒɛnɪk/ *adjective*
زیندەپێکهات(ـە) ۞ بیوژنیک

**biogeochemical** *adjective*
سەربە زیندەزەوی‌کیمیا: سەربە ئەو سوورە کە توخمە کیمیایی‌یەکان و ماکە سادەکان یان ئاوێتەکان لە نێوان سیستمە زیندووەکان و دەوروبەر یان ژینگەدا رادەگوێزرێ ۞ وابستە بە زمین‌شیمی زیستی

**biogeochemist** *noun*
زیندەزەوی‌کیمیازان ۞ زمین‌شیمی‌دان زیستی

**biogeochemistry** *noun*
زیندەزەوی‌کیمیا: زانستێ کە لەبارەی پێوەندی نێوان زەوی‌کیمیا geochemistry ی ناوچەیێکی دیاری‌کراو و flora و fauna ی (ئەو) دەکۆڵێتەوە و سوورانی کۆمەڵە توخمێکی وەک کاربۆن و نایترۆژێن لە نێوان ژینگە و خانەکانی ئۆرگانیزمە زیندووەکان دەگرێتەوە ۞ زمین‌شیمی زیستی

**biogeographic** *adjective*, also biogeographical /ˌbaɪəˈgræfɪkl/
زیندەجوگرافیایی، بایۆجوگرافیایی ۞ زیست‌جغرفیایی

**biogeography** *noun*
زیندەجوگرافی ۞ زیست‌جغرافی

**biographer** /baɪˈɒgrəfə(r), US -ˈɑːg-/ *noun*
ژیاننامەنووس، سەربوردنامەنووس ۞ زندگی‌نامەنویس

**biographic** /ˌbaɪəˈgræfɪk/ *adjective*, also biographical /ˌbaɪəˈgræfɪkl/
ژیان‌نامەیی، سەربوردنامەیی، سەربە ژیان‌نامە ۞ وابستە بە زندگی‌نامە

**biography** /baɪˈɒgrəfi, US -ˈɑːg-/ *noun*, *pl.* biographies
ژیان‌نامە، سەربوردنامە ۞ زندگی‌نامە، شرح‌حال

**biohazard** *noun*
مەترسی بیۆلۆژیکی، مەترسی لەسەر سلامەتی مرۆڤ یان ژینگە بەهۆی توێژینەوەی بایۆلۆژیکی biological research ۞ بیوهازارد

**bioinformatics** *noun, pl.*
بایۆئینفۆرماتیک: زانستی کۆکردنەوە یان شی‌کردنەوەی زانیاری‌یە بیۆلۆژیکی‌یە ئاڵۆزەکان وەک کۆدی بۆماوەیی‌یەکان genetic codes (bioinformatics *adj*: سەربە بایۆئینفۆرماتیک) ۞ بیوانفورماتیک

**biological** /ˌbaɪəˈlɒdʒɪkl, US -ˈlɑːdʒ-/ *adjective*
1 زیندەناسی‌یانە، سەربە زیندەوەرناسی: *the biological sciences* 2 زیندەوەری 3 (باوان یان منالێ) بە رێگای خوێنەوە پێوەندی‌یان هەیە، سروشتی ۞ 1 زیست‌شناختی 2 زیستی 3 طبیعی

**biological clock** *noun*
سەعاتی زیندەیی یان بایۆلۆژیکال، سەعاتی زیندەوەری (هی ئۆرگانیزمێ) ۞ ساعت زیستی

**biological control** *noun*
مەهار یان کونترۆڵی زیندەیی یان زیندەوەری (کونترۆڵی ئافات ب.ت. مێرووەکان، بە بەکارهێنانی دوژمنانی سروشتی خۆیان) ۞ مهار زیستی

**biological diversity** = biodiversity

**biologically** /ˌbaɪəˈlɒdʒɪkli, US -ˈlɑːdʒ-/ *adverb*
لەباری زیندەناسی‌یانە یان زیندەوەرناسی‌یانەوە ۞ از لحاظ زیست‌شناختی

**biological warfare** *noun*, also germ warfare
شەری میکرۆبی یا بایۆلۆژیکی ۞ جنگ بیولوژیکی

**biological weapon** *noun*
چەک‌وچۆلی میکرۆبی یان بایۆلۆژیکی ۞ تسلیحات بیولوژیکی

**biologism** /bʌɪˈɒlədʒɪz(ə)m/ *noun*
لێکدانەوەی ژیانی مرۆ لە روانگەی زیندەناسی‌یانەوە ۞ بیولوژیسم

**biologist** /baɪˈɒlədʒɪst, US -ˈɑːl-/ *noun*
زیندەناس، زیندەوەرناس، بایۆلۆژیست ۞ زیست‌شناس

**biology** /baɪˈɒlədʒi, US -ˈɑːl-/ *noun*
1 زیندەناسی، زیندەوەرناسی، بایۆلۆژی 2 گیانەوەر یان رووەکی ناوچەیێکی تایبەتی 3 تایبەتمەندی زیندەوەر یان ئۆرگانیزمێکی تایبەتی یان دەستەیێ لە زیندەوەرەکان ۞ 1 زیست‌شناسی 2 و 3 بیولوژی

**bioluminescence** /ˌbaɪəʊluːmɪˈnesns/ *noun*
زیندە(وەر)رۆشنایی، زیندەروونـاکی، زیندەدرەوشانەوە: تیشک‌دانەوەی زیندەکیمیایی رۆشنایی لە لایەن زیندەوەرەکانەوە، وەک گولەستێرە glow-worm و ماسی قووڵایی‌یەکانی دەریا ۞ زیست‌لیانی

**bioluminescenct** /ˌbaɪəʊluːmɪˈesnt/ *adjective*

زینده(وەر)ڕۆشن، زیندەڕووناک، زیندەدرەوشاوە ◌ زیستلیان

**biolumagnetism** *noun*

بایۆمەگناتیزم: کارلێککردنی ئۆرگانیزمە زیندووەکان لەگەڵ مەیدانە مەگناتیسییەکان ◌ بیومغناطیس

**biomass** /ˈbaɪəʊmæs, US ˈbaɪoʊ-/ *noun*

زیندەبارستە، زیندەوەربارستە (- سەرجەمی چەندێتی و بارستە یا قورسایی گیا و گیانەوەران لە ناوچەیەکی تایبەتیدا) ◌ زیستجرم

**biome** /ˈbʌɪəʊm/ *noun*

(ژینگەناسی) زیندەبوو(م)، زیندەمەڵبەند: کۆمەڵگایێکی سروشتی و گەورە کە لە flora و fauna پێکهاتووە و ژینگەیێکی بەربڵاوی تەنیوەتەوە، ب.ت. وەک توندرا و دارستانەکان ◌ بیومە

**biomechanical** *adjective*

◌ سەربە یان پێوەندی بە بایۆمیکانیکەوە هەیە وابستە بە بیومکانیک

**biomechanics** /ˌbaɪəʊməˈkænɪks, US ˌbaɪoʊ-/ *noun, pl.*

بایۆمیکانیک: لێکۆڵینەوەی قانوونە میکانیکییەکانی سەربە جووڵان و پێکهاتەی زیندەوەرەکان یان ئۆرگانیزمە زیندووەکان، میکانیکی چالاکی بیۆلۆژیکی و ب.ت. هی ماسوولکەیی (وەک لە جووڵان یان مەشقدا)، لێکۆڵینەوەی کرداری هێزە دەرەکی و نێوەکییەکانی لەشێکی زیندوو، پەرەسەندنی prosthesis ەکان، لێکۆڵینەوەی سروشتی میکانیکی رەوت و پرۆسە بیۆلۆژیکییەکان، وەک کاری دڵ و جووڵانی ماسوولکە ◌ بیومکانیک

**biomedical** /ˌbaɪəʊˈmedɪkl, US ˌbaɪoʊ-/ *adjective*

سەربە زیندەناسی و پزشکی ◌ بیومدیکال

**biomedicine** *noun*

زیندەناسی و پزشکی ◌ بیومدیسین

**biometeorological** *noun*

سەربە زیندەکەشناسی یان زیندەهەواناسی، پێوەند بە زیندەهەواناسییەوە هەیە ◌ وابستە بە بیومترولوژی

**biometeorologist** *noun*

زیندەکەشناس، زیندەهەواناس، زیندەوەرهەواناس ◌ بیومترولوژیست

**biometeorology** *noun*

زیندە(وەر)کەشناسی، زیندەهەواناسی: زانستێ کە لەمەڕ پێوەندی نێوان شتە زیندووەکان و دیاردە کەشییەکان atmospheric phenomena دەکۆڵێتەوە ◌ بیومترولوژی

**biometric** /ˌbaɪəʊˈmetrɪk, US ˌbaɪoʊ-/ *adjective*, also biometrical

سەربە زیندەپێوی یا زیندەوەرپێوی: *Biometric systems have several advantages over conventional identification methods* ◌ وابستە بە زیستسنجی

**biometrician** *noun*, also biometricist

زیندەپێو، زیندەوەرپێو، کەسێکی شارەزا لە زیندەپێوی ◌ زیستسنج

**biometry** /bʌɪˈɒmɪtri/ *noun*, also biometrics /bʌɪə(ʊ)ˈmɛtrɪks/

1 زیندەپێوی: زیندەوەرپێوی، بەکارهێنانی شیکردنەوەی سەرژمێرییانە بۆ زانیاری زیندەناسییانە، لێکدانەوەی ماوەی ڕێتێچووی ژیانی مرۆڤ 2 – biostatistics ◌ زیستسنجی

**biomimetic** *adjective*

(زیندەکیمیا) سەربە زیندەلاسایی، زیندەلاساییانە: سەربە یان ئاماژە دەکا بەو شێوە دەسکردانە کە لاسایی رەوت و پرۆسە زیندەکیمیاییانە دەکاتەوە ◌ وابستە بە بیومیمتیک

**biomimetics** *noun, pl.*

زیندەلاسایی ◌ بیومیمتیک

**biomineralization** *noun*

پێکهاتن یان کۆبوونەوەی کانەکان بەهۆی زیندەوەر و ئۆرگانیزمەکانەوە ب.ت. لەنێو شانە یان پێکهاتە بیۆلۆژیکییەکان (وەک ددان، ئێسک و لەپکەکان) ◌ بیومینرالیزاسیون

**biomolecular** *adjective*

زیندەگەردی، سەربە زیندەگەرد ◌ وابستە بە مولکول زیستی

**biomolecule** *noun*

زیندەگەرد: گەردیکی ئەندامی ب.ت. macromolecule ێ (وەک پرۆتێین یا nucleic acid) لە زیندەوەرەکاندا ◌ مولکول زیستی

**biomorph** *noun*

زیندەشێوە، زیندەبیچم ◌ زیستریخت

**biomorphic** *adjective*

سەربە زیندەشێوە، زیندەبیچمی ◌ وابستە بە زیستریخت

**bionic** /baɪˈɒnɪk, US -ˈɑːnɪk/ *adjective*

بایۆنیک، سەربە زیندەمەهارناسی یان بایۆمەهارناسی یان زیندەوەرمەهارناسی (لە چیرۆکە زانستییەکاندا) ◌ زیستارشناختی

**bionically** /baɪˈɒnɪkli, US -ˈɑːnɪkli/ *adverb*

لەباری بایۆنیکەوە، لەباری زیندەمەهارناسی یان بایۆمەهارناسی(یەوە) ◌ از لحاظ زیستارشناختی

**bionics** *noun, pl.*

بایۆنیکس، بایۆمەهارناسی، زیندەمەهارناسی، زیندەوەرمەهارناسی ◌ زیستارشناسی

**bionomic** *adjective*, also bionomical

بایۆنامیک، سەربە ژینگەناسی ◌ وابستە بە بومشناسی، بومشناختی

**bionomically** *adverb*

لەباری بایۆنامیک یان ژینگەناسی(یەوە) ◇ از لحاظ بوم‌شناختی

**bionomics** /ˌbʌɪə(ʊ)ˈnɒmɪks/ *noun, pl.*
بایۆنامیکس، ژینگەناسی، ئێکۆلۆژی: لێکۆڵینەوەی هەڵس‌وکەوت behaviour و گونجان یان سازانی adaptation زیندەوەرەکان organisms لە ژینگەی habitat سروشتی‌یەکەیان ◇ بوم‌شناسی

**-biont** *suffix*
پاشگر: زیندەوەری، بوونەوەری، ئۆرگانیزمی، بەشێکی زیندەوەر یان ئۆرگانیزم: *phycobiont* ◇ پسوند: یک موجود زنده، بخشی از موجود زنده

**biophagous** *adjective*
زیندەخۆر، بایۆفاگۆس: گیانەوەرێ کە لە ماکی زیندوی ئەندامی زیندوو دەخوا ◇ بیوفاگوس

**biopharmaceutical** *noun, adjective*
دەرمانێ کە لە سەرچاوە بایۆلۆژی‌یەکان بەرهەم هاتووە و ب.ت. ئەوەی کە بە رێگای بایۆتێکنۆلۆژی‌یەوە بەرهەم هاتبێ ◇ بیوفارماسیوتیکال

**biophysical** *adjective*
زیندەفیزیکی، سەربە زیندەوەرفیزیک یان زیندەفیزیک ◇ زیست‌فیزیکی

**biophysicist** *noun*
زیندە(وەر)فیزیک‌زان ◇ زیست‌فیزیکدان

**biophysics** /ˌbaɪəʊˈfɪzɪks, US ˌbaɪoʊ-/ *noun, pl.*
زیندەفیزیک، زیندەوەرفیزیک ◇ زیست‌فیزیک

**biopic** /ˈbaɪəʊpɪk, US ˈbaɪoʊ-/ *noun*
(نافەرمی) فیلمێ لەبارەی ژیانی کەسێکی تایبەتەوە، فیلمەژیان‌نامە، فیلمەسەربردە، فیلمی ژیان‌نامەیی ◇ بیوپیک

**biopolymer** *noun*
زیندەفرەپار(ژە) (مەتریالێکی پۆلیمێریک یان فرەپار(ژە)ی ناو زیندەوەرەکان، ب.ت. پرۆتئین، سیلیۆلۆز یان DNA) ◇ بیوپولیمر

**bioprospecting** *noun*
بایۆپراسپێکتینگ: گەڕان بە دوای جۆری رووەکی یان گیانەوەری کە دەرمانی پزشکی یان کۆمەڵە ناوێتەیێکی بەنرخی تر لەباری بازرگانی‌یەوە لێ بە دەست دێنرێ ◇ بیوپروسپیتینگ

**bioprospector** *noun*
کەسێ کە کاری بایۆپرۆسپێکتینگ دەکا ◇ بیوپروسپکتور

**biopsy** /ˈbaɪɒpsi, US -ɑːpsi/ *noun, pl.* biopsics
شانەدەرکێشی، شانەبری (لابردن یان تاقی‌کردنەوەی شانەیێ لە لەشی کەسێ کە نەخۆشە، بە مەبەستی دۆزینەوەی زیاتر لەبارەی نەخۆشی‌یەکەوە) ◇ بافت‌برداری

**biopsychology, etc** = psychobiology, etc

**bioreactor** *noun*
بایۆریاکتۆر ◇ بیورئاکتور

**bioregion** *noun*
زیندەناوچە ◇ بیوریجیون، زیست‌ناحیه

**bioregional** *adjective*
زیندەناوچەیی، سەربە زیندەناوچە ◇ وابسته به بیوریجیون

**bioregionalism** *noun*
زیندەناوچەگەری، بایۆریجیۆنالیسم (باوەڕێ کە دەبێ چالاکی‌یەکانی مرۆڤ دەبێ بخرێتە ناو چوارچێوەی ژینگەناسی و جوگرافیاوە تا هی سیاسی) ◇ بیوریجیونالیسم

**bioregionalist** *noun*
زیندەناوچەگەر، زیندەوەرناوچەگەر بایۆریجیۆنالیست ◇ بیوریجیونالیست

**biorhythm** /ˈbaɪəʊrɪðəm, US ˈbaɪoʊ-/ *noun*
سووڕی زیندەیی یان زیندەوەری، بایۆریزیم، بایۆریتم ◇ چرخەی زیستی

**biorhythmic** *adjective*
سەربە سووڕی زیندەیی یان بایۆریزیم ◇ وابسته به چرخەی زیستی

**BIOS** *abbreviation* Basic Input/Output System
(کامپیوتێر) بایۆس، بیۆس: کۆمەڵە دەستووریکی کامپیوتێر لە firmware دا کە کردارەکانی ئینپوت و ئەوتپوت کۆنترۆڵ ئەکا ◇ بیوس

**biosafety** *noun*
زیندەپارێزی: راگرتنی بارودۆخی بێ‌مەترسی لە توێژینەوە زیندەناسی‌یەکاندا سەبارەت بە پێشگیری لە زیان گەیشتن بە مرۆڤ، بوونەوەرە ناتوێژینگەیی‌یەکان یان ژینگە ◇ بیوسافتی

**bioscience** /ˌbaɪəʊˈsaɪəns, US ˌbaɪoʊ-/ *noun*
هەر یەک لە زانستەکانی ژیان ◇ بیوساینس

**bioscientist** *noun*
زانستەوانی هەر یەک لە زانستەکانی ژیان ◇ بیوساینتیست

**bioscope** *noun*
(زۆرتر ئەفریکای باشووری) سینەما، فیلم ◇ سینما، فیلم

**biosecurity** /ˈbaɪəʊsɪˈkjʊərəti, US ˈbayousəˈkjʊərəti/ *noun*
چالاکی بەرگیری لە تەنینەوە و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و ئازاری رووەکی و گیانەوەری لە مەڵبەندێکەوە بۆ یەکێکی تر: *the importance of biosecurity in poultry farming* ◊ *biosecurity measures to prevent another outbreak* ◇ بیوسکیوریتی

**biosensor** *noun*
زیندەهەستەوەر: دەزگایێ بۆ بەکارهێنانی

زیندەوەرەکان یان گەردە بایۆلۆژیکی یەکان، ب.ت. هەوینە یان ئاتتی بادی یەکان، بۆ دۆزینەوە یان دەس نیشان کردنی بوونی ماکە کیمیایی یەکان ۞ بیوسنسور

**-biosis** *suffix, pl.* bioses

پاشگر: شێوەی ژیان: para*biosis* ۞ پسوند: طرز زندگی

**biosolids** *noun, pl.*

ماکێکی ئەندامی کە لە ئاوەڕۆ یان پاشەڕۆ دەس خراوەتەوە، ب.ت. لە بواری کشت وکاڵدا بەکاردێنرێ ۞ بیوسالیدس

**biosphere** /'baɪəʊsfɪə(r), US 'baɪoʊsfɪr/ *noun*

بایۆسفێر، زیندەچین، زیندەوەرچین، چینەژینە، زیندەسفێر ۞ زیستکره

**biospheric** *adjective*

سەربە بایۆسفێر، چینەژینەیی ۞ وابسته به زیستکره

**biostatistic** *adjective*

سەربە زیندەسەرژمێری (زیندەوەرەکان) ۞ وابسته به بیواستاتیک

**biostatistics** *noun, pl.*

زیندەسەرژمێری، سەرژمێری زیندەوەرەکان، زیندەوەرسەرژمێری ۞ بیواستاتیک

**biostratigrapher** *noun*

بایۆستراتیگرافێر ۞ بیواستراتیگرافر

**biostratigraphic** *adjective,* also biostratigraphical

سەربە بایۆستراتیگرافی ۞ بیواستراتیگرافی

**biostratigraphy** /ˌbʌɪə(ʊ)strəˈtɪɡrəfi/ *noun*

لقێ لە stratigraphy لەبارەی بووبەردەکان و بەکارهێنانیان بۆ دیاریکردنی ڕێکەوتی پێکهاتنی بەردەکان ۞ بیواستراتیگرافی

**biosynthesis** *noun*

پێکهاتنی ئاوێتە کیمیایی یەکان لە لایەن کاری ئۆرگانیزمە زیندووەکانەوە؛ بەرهەمهاتنی ئاوێتەیێکی کیمیایی لە لایەن ئۆرگانیزمێکی زیندووەوە (یان زیندەوەرێکەوە) ۞ بیوسنتز

**biosynthetic** *adjective*

سەربە biosynthesis ۞ وابسته به بیوسنتز

**biosystematics** *noun, pl.*

بایۆسیستماتیک: پۆلێن ناسی taxonomy لەسەر بنچینەی توێژینەوەی گەشەسەندنی بۆماوەیی یان ژێنێتیکی حەشیمەتەکانی گیانەوەران و ڕووەک و گیا ۞ بیوسیستماتیک

**biota** /bʌɪ'əʊtə/ *noun*

بایۆتا، زیندەمەنی: ڕووەک و گیانەوەرانی ناوچە، ژینگە یان سەردەمێکی زەوی ناسی، flora و fauna ی ناوچەیی ۞ بیوتا

**biotech** = short for biotechnology

**biotechnological** *adjective*

زیندەتێکنۆلۆژیکاڵ ۞ وابسته به تکنولوژی یا فناوری زیستی

**biotechnologist** *noun*

زیندەتێکنۆلۆژیست ۞ بیوتکنولوژیست

**biotechnology** /ˌbaɪəʊtek'nɒlədʒi, US ˌbaɪoʊtek'nɑːl-/ *noun*

زیندەتێکنۆلۆژی، زیندەوەرتێکنۆلۆژی، بایۆتێکنۆلۆژی ۞ تکنولوژی یا فناوری زیستی

**biotelemeter** *noun*

زیندەدوورپێو، زیندەمەودا پێو ۞ بیوتلمتر

**biotelemetric** *adjective*

سەربە زیندەدوورپێوی یان زیندەمەوداپێوی ۞ وابسته به بیوتلمتری

**biotelemetry** *noun*

زیندەدوورپێوی، زیندەوەردوورپێوی، زیندە(وەر)مەوداپێوی: (بە)شوێن کەوتن یا چاودێری(کردن) مرۆڤ و ئاژەڵ لە مەوداییکەوە بە بەکارهێنانی دوورپێو telemetre، دۆزینەوە و پێوانی کار و چالاکی یان بارودۆخی مرۆڤ و گیانەوەران (وەک لێدانی دڵ و تێمپراچێری لەش) لە مەوداییکەوە ۞ بیوتلمتری

**bioterrorism** *noun*

زیندەترۆریزم، زیندەترسکاری، زیندەترۆرکاری (= ترۆریزمێ کە لەودا چەک وچۆڵی بایۆلۆژیکی بەکاردێنرێ، کردەوەیێکی توندوتیژانە کە ماکی زیندوو وەک بەکتریا بەکاردێنێ بۆ هەڕەشە یان کوشتنی خەڵک بۆ مەبەست و هۆی سیاسی) ۞ بیوتروریسم

**bioterrorist** *noun, adjective*

زیندەترۆریست، زیندەترسکار، زیندەترۆرکار، زیندەترۆریستی ۞ بیوتروریست، بیوتروریستی

**biotic** /bʌɪ'ɒtɪk/ *adjective,* also biotical

زیندەیی، ژینی، ژیانی: *biotic diversity* ۞ زیستی، حیاتی

**-biotic** *suffix*

پاشگر: خاوەنی شێوەیێکی (تایبەتی) ژیان: *endobiotic* (بنەڕەت: لە *biōtikos* یونانی یەوە) ۞ پسوند: دارای طرز زندگی خاص

**biotic potential** *noun*

توانایی ژیان: توانستی ژیان: توانایی خۆماکی زیندەوەرێ یان جۆرێ بۆ زاوزێ یان مانەوە ۞ استعداد حیاتی

**biotin** /'bʌɪətɪn/ *noun*

(زیندەکیمیا) بایۆتین: ڤیتامین H، B ی ئاوێتە یا تێکەڵ ($C_{10}H_{16}O_3N_2S$)، لە زەردێنەی هێلکە، جەرگ و ماستدا هەیە ۞ بیوتین

**biotite** /'bʌɪətʌɪt/ *noun*

بایۆتایت، بیۆتیت، بایۆتیت: جۆرێ کانی توێ توێی ڕەش، قاوەیی توند و ڕەشی سەوزباو، وەک پێکهێنەری زۆر تەختەبەرد و کەڤری

(ویژەیی) داگیراو بە دار یان دەوەنەوە ◌ پوشیده از درخت یا بوته

**bo'sn** – boatswain

**Bosnian** /'bɒznɪən/ *noun, adjective*

*n* خەڵکی بوسنیا، بوسنیایی *adj* پێوەندی بە بوسنیاوە هەیە، سەربە Bosnia یان خەڵکەکەی، بوسنیایی ◌ بوسنیایی

**bosom** /'bʊzəm/ *noun, adjective*

*n* 1 مەمک، سینگ، بەر، بەرۆک 2 باوەش، ئامێز، باخەڵ، خەرک 3 دڵ، جەرگە، نێوەڕاست *adj* نزیک، گەرموگوڕ، دۆستانە ( -bosomed *adj*: مەمکگەورە، bosomy /'bʊzəmi/ *adj*: مەمکقیت، سنگقیت، (مەمک)شەمەند) ◌ *n* 1 سینه، پستان 2 آغوش 3 قلب *adj* صمیمی

**bosom friend** *noun*, also bosom buddy

دۆستی گەرموگوڕ یان گیانیگیانی: *The two girls had become bosom friends* ◌ دوست صمیمی

**boson** /'bəʊzɒn/ *noun*

(فیزیک) بۆزۆن: پارچۆڵکەیێکی ژێرگەردیلەیی، بۆزۆن (bosonic *adj*؛ بنەڕەت: لە ناوی فیزیکزانی هیندی Satyendranath *Bose* + -on) ◌ بوزون، بوسون

**boss**[1] /bɒs, US bɔːs/ *noun, adjective*

*n* 1 سەرۆک، گەورە 2 سەرکار، سەرکرێکار، بەڕێوەبەر، ساحێبکار، سەرپەرشت 3 (لە بانگکردندا) بەڕێز، جەناب *adj* (لە ئەمریکا (ی باکووری) = excellent ◌ 1 رئیس 2 کارفرما 3 مافوق، جناب (در خطاب)

**boss**[2] /bɒs, US bɔːs/ *noun*

1 گومەزی، دەرپەڕیوی، قوبە 2 قوبەی مەتاڵ، توپ، گۆیکە یان سنگی نێوەڕاستی مەتاڵ، قووچکەی قەڵغان 3 سنگ، گۆیکە، گوڵمێخ، ئاخیە 4 (زەویناسی) کەڵەبارستاییێ (هی تەختەبەردە ئاگرینەکان) کە دەرپەڕیوەتە نێو چینێکی تر، گومەزە 5 بەشی ناوەندی پەروانە propeller، توپ 6 بەشێکی گرێئاسای سەر لەش یان هێندێ ئەندامی گیانەوەران یان رووەک و گژوگیا 7 (بیناسازی) گوڵمێخ ◌ 1 قبه 2 گل‌سپر 3 گلمیخ 4 باس 5 قسمت مرکزی پروانه 6 باس 7 قرصک آذینی

**boss**[3] *noun*

(نافەرمی، ئەمریکا) مانگا، calf ◌ گاو

**bossa nova** /ˌbɒsə 'nəʊvə/ *noun*

1 جۆرێ هەڵپەڕکێ لە شێوەی samba بە رەچەڵەک هی بڕیزیل 2 پارچە موسیقایێ بۆ ئەو سەما یان هەڵپەڕکێیە ◌ بوسا نووا

**boss-eyed** *adjective*

(بریتانیا و نافەرمی) خێل، چاولار، یەکچاو، کوێری یەکچاو، قەل، cross-eyed، squinting ◌ لوچ، یکچشمی

**bossism** *noun*

(ئەمریکا) کۆنترۆلی پارتییێکی رامیاری لە لایەن بەڕێوەبەرانییەوە ◌ باسیسم

**bossy**[1] /'bɒsi, US 'bɔːsi/ *adjective* (bossier, bossiest)

1 زۆردار، ملهوڕ، کەڵەگا، دیکتاتۆر، دەسەڵاتخواز، سەردەست، بالادەست، 2 dictatorial قۆقز، زەق ( bossily /'bɒsɪli, US 'bɔːsɪli/ *adv*: سەردەستانە، کەڵەگایانە، زۆردارانە، دیکتاتۆرانە؛ bossiness /'bɒsinəs, US 'bɔːsinəs/ *n*: دەسبەسەرداگرتن، کەڵەگایی، سەردەستی، بالادەستی، دیکتاتۆری) ◌ 1 مستبد، سلطه‌جو 2 محدب

**bossy**[2] /'bɒsi, US 'bɔːsi/ *noun, pl.* bossies

(نافەرمی، ئەمریکا) مانگا یان گوێلک ◌ (عامیانه) گاو یا گوساله

**bossyboots** /'bɒsibuːts, US 'bɔːs-/ *noun, pl.* same

(نافەرمی) کەسێکی زۆردار، مرۆ یان کەسێکی دەسەڵاتخواز ◌ آدم مستبد

**bo'sun** /'bəʊsn, US 'boʊ-/ – boatswain

**Boston** *noun*

1 جۆرێ کایەی بە پەڕ، لە solo whist دەچێ 2 سەمایێ کە برێ شێوەی waltz دەدا ◌ بوستون

**Boston baked beans** = baked beans

**Boston crab** *noun*

جۆرێ هونەر یان تکنیکی زۆرانبازی ◌ نوعی فن کشتی

**Boston cream pie** *noun*

جۆرێ کەیکی خڕ ◌ نوعی کیک

**Boston fern** *noun*

فێرنی بۆستۆنی، جۆرێ سەرەخسی شمشێری ◌ [*Nephrolepsis exaltata bostoniensis*] سرخس بوستونی

**Bostonian** *noun, adjective*

*n* رەسەن یان دانیشتووی بۆستۆن، بۆستۆنی، بنکەی هەرێمی ماساچوسێت *adj* سەربە یان پێوەندی بە بۆستۆنەوە هەیە ◌ بوستونی

**Boston ivy** *noun*

جۆرێ Virginia creeper گەڵا سێپلی، لەبەر پەلوپۆیەکەی دەکرێ [ *Parthenocissus tricuspidata*] ◌ نوعی پیچک

**Boston marriage** *noun*

پێوەندی درێژماوەی خۆشەویستی نێوان دوو ژن ◌ زناشوئی بوستونی

**Boston terrier** *noun*

جۆرێ تاجی چکۆلەی ماساچوسێت، دوورەگەی bulldog و terrier ◌ بوستون تریر

**bosun** /'bəʊs(ə)n/ (also bo'sun) – boatswain

**Boswell** *noun*

کەسێ کە بە وردی ژیانی کەسانی گرنگ تۆمار دەکا (**Boswellian** *adj*؛ بنەڕەت: لە ناوی ژیاننامەنووسی سکاتلەندی جیمز بۆسوێل (James *Boswell* ⟡ بوسول

**bot**[1] /bɒt, US bɑ:t/ *noun*
کرمۆکەی کەرمێش ⟡ botfly لیسەی خرمگس

**bot**[2] *abbreviation* 1 botanic, botanical, botany 2 bottle 3 bought

**bota** *noun*
بۆتا: شووشە یان بوتڵی چەرمی (وەک بۆ مەی) ⟡ بوتا

**botanical** /bəˈtænɪkl/ *adjective, noun,* also botanic
*adj* رووەکناسی‌یانە، سەربە رووەکناسی، گیاناسی‌یانە *n* مەتریالی کە لە رووەک گیراوە ⟡ *adj* گیاەشناختی *n* بوتانیکال

**botanical gardens** *noun,* also botanic gardens
باخ یا باخچەی رووەکناسی ⟡ باغ گیاەشناسی

**botanist** /ˈbɒtənɪst, US ˈbɑ:t-/ *noun*
رووەکناس، گیاناس ⟡ گیاەشناس

**botanizing** *noun,* also botanising
لێکۆڵینەوەی رووەک لە ژینگەی خۆیدا ⟡ بوتانیزینگ

**Botany** /ˈbɒtəni, US ˈbɑ:t-/ *noun,* also Botany wool
خوری میرینووس ⟡ پشم مرینوس

**botany** /ˈbɒtəni, US ˈbɑ:t-/ *noun*
رووەکناسی، گیاناسی (بنەڕەت: لە *botanique* فەڕەنسی، لەسەر بنەمای *botanikos* یونانی، لە *botanē* "رووەک" + (-y[2] ⟡ گیاەشناسی

**botch** /bɒtʃ, US bɑ:tʃ/ *noun,* also botch-up
1 (نافەرمی) بەفشە سەریەکخستن، کاری ترەکەلەک یان سەرسەرەکی، کاری خراپکراو، گەندەلکاری، گووکاری، کەلەکشەیتان 2 پینەی خراپ ⟡ 1 سرهم‌بندی 2 وصلەی ناجور

**botched** *adjective*
ترەکەلەک، ترپەند، بەفشە سەریەکخراو، بەفشەکراو، گووکاری، شپرزە، کەلەکشەیتان ⟡ سرهم‌بندی‌شدە، افتضاح

**botchery** *noun*
کاری سەرسەرەکی، فشەکاری، ترەکەلەک ⟡ سرهم‌بندی

**botel** = boatel

**botfly** /ˈbɒtflaɪ/ *noun, pl.* botflies
(گیانەوەرناسی) کەرمێش، مێشەکەرانە، مۆز، زلمێش، مشەخۆری ئەسپ و گیانەوەرانی ترە [*Gasterophilus* و تۆخمەکانی تر] ⟡ خرمگس

**both** /bəʊθ, US boʊθ/ *adjective, adverb, preposition*
هەردووک، هەردک، هەرتک، هەردوو، هەم... هەم، هەردووکیان ⟡ هردو، هم... هم، هردوتا

**bother** /ˈbɒðə(r), US ˈbɑ:ð-/ *interjection, noun*
*interj* وەی، ئەهە ئاخ: *Bother! I've left my wallet at home* *n* چەڵەمە، گیروگرفت، کووس‌وکەوان، کێشە، سەرێشە، دڵەراوکێ، نیگەرانی، ملۆزم، مایەی کووس‌وکەوان، بێزارکەر، وەڕەس‌کەر، هەراسانکەر: *I hope I haven't been a bother* ⟡ *interj* وای، آخ *n* زحمت، دردسر، مزاحم، مایەی مزاحمت، اسباب دردسر

**botheration** /ˌbɒðəˈreɪʃn, US ˈbɑ:ð-/ *interjection*
وەی، ئەهە ئاخ، وەی‌ڕۆ، دەی‌ڕۆ ⟡ آخ، وای، آه

**bothersome** /ˈbɒðəsəm, US ˈbɑ:ðərsəm/ *adjective*
مزاحیم، ملۆزم، هەراسانکەر، بێزارکەر، عاجزکەر، ئازاردەر، مایەی سەرێشە، پردەردەسەر ⟡ مزاحم، مایەی دردسر

**bothy** /ˈbɒθi/ *noun,* also bothie, *pl.* bothies
(لە سکاتلەند) کۆختەی چکۆلانە بۆ کرێکارانی کێڵگە یا وەک پەنا و پەسیوی سەرکێو ⟡ بوتی

**boto** = boutu

**Botox** /ˈbəʊtɒks, US ˈboʊtɑ:ks/ *noun*
بۆتۆکس (= مەتریالی کە ماسوولکەکان دەحەسێنێتەوە، و جاروبار لە دەوری چاویان دەدەن(بە دەرزی) تا چرچ‌یەکەی لابەن، لە (bo(tulinum) tox(in) ⟡ بوتوکس

**bo tree** = pipal

**botryoid** *adjective,* also botryoidal /ˌbɒtrɪˈɔɪd(ə)l/
هێشوویی ⟡ خوشەای

**Botswanan** /bɒˈtswɑ:nən/ *noun, adjective*
*n* خەڵکی بۆتسوانا، بۆتسوانایی، وڵاتێ لە باشووری ئەفریکا *adj* سەربە بۆتسوانا، بۆتسوانایی ⟡ بوتسوانایی

**botte** /bɒt/ *noun*
(فەڕەنسی، شمشێربازی) هێرش، پەلامار ⟡ حملە

**bottle** /ˈbɒtl, US ˈbɑ:tl/ *noun*
1 شووشە، بوتڵ 2 شووشەی شیر 3 شیری وشک، شیری مانگا (لە بەرامبەر شیری دایکدا) 4 خواردنەوەی ئەلکۆل، ئارەق، خواردنەوە 5 دڵوجەرگ، ویران 6 کەپسوول یان لوولەکی گاز 7 پڕشووشەیێ، شووشەبەر ⟡ 1 بطری، شیشە 2 شیشەی شیر 3 شیر خشک، شیر گاو 4 مشروب‌خور، مشروب 5 تهور 6 کپسول گاز 7 مقدار گنجایش یک شیشە

**bottle bank** *adjective*
شووشەخانە، بانکی شووشە، شووشان ⟡ بانک بطری

**bottlebrush** *noun*
1 فڵچەشووشە، فڵچەی لوولەکی بۆ

خاوێن کردنەوەی ناوەوەی شووشە 2 کلکەئەسپ، فلچەی بوتل، دەوەن یان دارۆچکەیێکی ئەوسترالیایی، شێوەی فلچەشووشە دەدا [توخم *Callistemon*] ◌ بوتل‌بروش

**bottled** *adjective*

شووشەیی، کانگایی (ئاو) ◌ بطری، معدنی

**bottleful** *noun, pl.* bottlefuls

پڕشووشەیێ، شووشەبەرێ، شووشەیێ ◌ بە اندازەی یک بطری

**bottle gourd** *noun*

کوولەکەخەیارە [*Lagenaria siceraria*] ◌ کدوی قلیانی

**bottle-green** *adjective*

سەوزی تۆخ، کەسکی پڕڕەنگ ◌ سبز تیره

**bottle jack** *noun*

(نیوزیلەند) هەلێن یان جەکی بوتلی ◌ جک بطری‌مانند

**bottleneck** /'bɒtlnek, US 'bɑːtl-/ *noun*

1 تەنگە، تەسکەرێ، باریکەرێ، باریکان 2 هۆکاری خاوکەرەوە، ڕێبەست، ڕێبەند 3 تەنگانە ◌ 1 گلوگاه 2 عامل کندساز 3 مضیقه

**bottle-opener** *noun*

شووشەکەرەوە، سەرهەلێچر ◌ دربطری‌بازکن

**bottle-party** *noun*

میوانی شووشەیی (میوانی‌یێ کە لەودا هەر میوانێ لەگەڵ خۆی شووشەیێ مەی دێنێ) ◌ بوتل‌پارتی

**bottler** *noun*

(نافەرمی) شت یان کەسێکی جێی پەسند ◌ چیز یا آدم مقبول

**bottlescrew** = turnbuckle

**bottom** /'bɒtəm, US 'bɑːtəm/ *noun, adjective*

*n* 1 خوارترین بەش، بن، ژێر، خوارەوە 2 بنک، تەرک، بندین، تەختاو، بنکاو، بنرەخ 3 قووڵایی 4 سەرچاوە، بنەما، ماک، بنەڕەت، چاوگ 5 پشتەوە، دواوە 6 کنگ، پاشوو، پاشل، سمت 7 کۆتایی، دوایی، دووماهی 8 بنی کەشتی، لاشە یان پەیکەرەی کەشتی *adj* 1 ئاخرین، دوایین، هەرەخواروو 2 بنەڕەتی، بنچینەیی، سەرەکی ◌ *n* 1 پایین‌ترین بخش، تە، پایین 2 بستر، کف 3 عمق 4 منشأ، اساس، سرچشمە 5 عقب 6 سرین، نشیمن 7 انتها، پایان 8 تە یا بدنەی کشتی *adj* 1 آخرین 2 اساسی

**bottom dolar** *noun*

دوایین دۆلار ◌ آخرین دلار

**bottom drawer** *noun*

جیازی، ڕەهال، ناوتیلانە، باوانی (بووک) ◌ جهاز عروس

**bottomless** /'bɒtəmləs, US 'bɑːt-/ *adjective*

1 بێ‌بن، بێ‌پەی، قووڵ، کوور 2 لەڕادەبەدەر، بێ‌ئەندازە، بێ‌ڕادە ◌ 1 بی‌تە، عمیق 2 بی‌حدوحصر، نامحدود

**bottom line** *noun*

1 ئەنجام، ئاکام، پێ‌ئاژۆ 2 خاڵی بنچینەیی، هۆکاری دیاریکەر: *The bottom line is that we have to make a decision today* 3 قازانج و زیان، خێر و زەرەر 4 پوختەی قسە، دواوتە ◌ 1 پیامد، ماحصل 2 نکتەی اصلی 3 سود و زیان 4 خلاصەی کلام

**bottommost** *adjective*

نزم‌ترین، خوارترین، بن‌ترین ◌ پایین‌ترین

**bottom price** *noun*

کەم‌ترین یان نزم‌ترین نرخ ◌ پایین‌ترین قیمت

**bottomry** /'bɒtəmri/ *noun*

بارمتەدانانی کەشتی ◌ گروگذاری کشتی

**bottom up** *interjection*

هەڵی‌دێرە (لە خواردنەوەدا) ◌ بنداز بالا

**botty** *noun, pl.* botties

(نافەرمی، بریتانیا) سمت، کنگ، پاشل ◌ نشیمن، سرین

**botulin** /'bɒtjulɪn, US 'bɑːtjə-/ *noun*, also botulinum toxin /ˌbɒtjʊ'lʌɪnəm/ also botulinus toxin

بۆتولین، باتیۆلین (ماکێکی ژاراوی لە بەکتریادا، کە دەبێتە هۆی نەخۆشی بۆتولیزم) ◌ بوتولین

**botulism** /'bɒtjulɪzəm, US 'bɑːtʃə-/ *noun*

بۆتولیزم، باتیۆلیزم (جۆرێ نەخۆشی سەختە کە لە ئەنجامی بەکتریای چێشتی خراپ‌هەڵگیراوەوە تووش دەبێ) ◌ بوتولیسم

**boudin** /'buːdã/ *noun, pl.* same

جۆرێ فەرەنسی black pudding ◌ بودین

**boudoir** /'buːdwɑː(r)/ *noun*

بوودوار، دیو یا ژووری تایبەتی یا خەو (ژنان) ◌ اتاق خصوصی یا خواب

**bouffant** /'buːfɒ̃, US buː'fɑːnt/ *adjective, noun*

*adj* فوودراو، هەڵمساو؟ (جۆرێ شێوازی قژی سەر) *n* مۆد یان شێوازی هەڵمساو ◌ *adj* پف‌کرده *n* مد پف‌کرده

**bougainvillaea** /ˌbuːgən'vɪliə/ *noun*, also bougainvillaea

(ڕووەکناسی) بووگێنڤیلیا [توخم *Bougainvillea*] ◌ گل کاغذی

**bough** /baʊ/ *noun*

پەل، تای، گەورەلق ◌ شاخەی اصلی

**bought** /bɔːt/ = past and past participle of buy

**boughten** /'bɔːt(ə)n/ *adjective*

کڕیاری (تا کە هی ماڵێ بێ) ◌ خریده‌شده

**bougie** /'buːʒi/ *noun, pl.* bougies

(پزشکی) میلی نەشتەرگەری ◇ میل جراحی

**bouillabaisse** /'bu:jəbeɪs/ *noun*
سوپی ماسی ◇ سوپ ماهی

**bouillon** /'bu:jɒn, -jɒ̃, US -ja:n/ *noun*
سوپی تراو، شۆرباو شلپیتاو ◇ بویان

**boulder** /'bəʊldə(r), US 'boʊl-/ *noun*
خرانکە، تاوێر، خرۆڵکە (گاشەبەردێ لەبەر بارێ کەش یان باران خربۆتەوە)، بەرد، کەڤر، تەختەبەرد، گاشەبەرد، گرەبەرد، تاشەبەرد، گابەرد (کورتەی *boulderstone* ی سەرەتای بنەڕەت سکاتلەندی) ◇ گرداله، سنگ، تخته‌سنگ

**boule**[1] /bu:l/ *noun*, also boules
جۆرێ فەرەنسی یاری bowls (بە تۆپی ئاسنی دەکرێ) ◇ بول

**boule**[2] /bu:l/ *noun*
ئەنجومەنی پیران و نوێنەران (یۆنان) ◇ شورای شیوخ و نمایندگان

**boulevard** /'bu:ləva:d, US 'bʊləva:rd/ *noun*
بولڤارد، دارەڕێ: *Sunset Boulevard* ◇ بولوار

**bouleversement** *noun*
(فەرەنسی) شێواوی، شڵەژاوی، شڵەژان ◇ آشفتگی

**bounce** /baʊns/ *noun*
1 گەڕانەوە، زڤرین 2 باز یان پەڕینی کتوپڕ، قەڵبەز، هەڵبەزینەوە، هەڵپەڕوداپەڕ، هەڵبەزودابەز، چالاکی، جموجۆڵ، بەکەیفی، سەرخۆشی، بەگوڕی، سەرشادی، بەپەرۆشی 3 لێدانی بەهێز و کتوپڕ ◇ 1 برگشت 2 جهش ناگهانی، نشاط، فعالیت، سرزندگی 3 ضربه‌ی قوی و ناگهانی

**bouncer** /'baʊnsə(r)/ *noun*
کەڵەگا، پارێزەر، پاسەوان، کێشەڕەوێن (مەیخانە، کابارە، کازینۆ و هتد) ◇ گردن‌کلفت، محافظ

**bouncing** /'baʊnsɪŋ/ *adjective*
ساغ، بەکەیف، بەکار، لەشەوق، پڕجموجۆڵ، چالاک، لەش‌ساغ، تەندروست، lively، robust ،animated ◇ سالم، سرزنده، پرانرژی

**bouncing Bet** = soapwort

**bouncy** /'baʊnsi/ *adjective* (bouncier, bounciest)
1 بەکەیف، بەنەشە، سەری‌حاڵ، لەجۆش، بەگوڕ، بەجموجۆڵ، دڵخۆش، بەپەرۆش، buoyant، exuberant 2 بەهێزە بۆ گەڕانەوە، وەگەڕۆک، خاوەنی هێزی گەڕانەوە (تۆپ) 3 فەنەری (bouncily /'baʊnsɪli/ *adv*) ◇ 1 فعال، سرزنده، بانشاط 2 دارای قدرت برگشت (توپ) 3 فنری

**bound**[1] /baʊnd/ *noun, adjective*
1 قەڵەمباز، پەڕین، بازدان، باز، گومەتە 2 گەڕانەوە، زڤرین، هەڵبەز و دابەز ◇ 1 پرش، جهش 2 برگشت، ورجه ورجه

**bound**[2] /baʊnd/ *adjective*
1 مسۆگەر، بێ‌ئەملاوئەولا، یەکلایی‌کراوە، دڵنیا 2 پێبەند، پابەست، ئەرک‌لەسەر، دەربەست، خۆبەستە 3 لەسەرسوور، شێلگیر، بەبڕیار 4 بەڕێوە، ڕۆیشتوو، ئامادەی ڕۆیشتن 5 سەربە، بەستراو، بەستە، بەندە (بە)، پێوەندی هەیە، پێوەندیدار 6 دڵبەستە، هۆگر 7 جزوبەندکراو، بەرگ‌تێگیراو، شیرازەبەند(کراو) 8 قەبز، گیر، بەگیر، تووش‌بوو بە قەبزی ◇ 1 مسلم، محرز، قطعی 2 مقید، متعهد 3 مصمم 4 عازم 5 وابسته، مربوط 6 علاقه‌مند 7 صحافی شده، جلدشده 8 دچار یبوست

**bound**[3] /baʊnd/ = past and past participle of bind

**boundary** /'baʊndri/ *noun, adjective*. *pl.* boundaries
*n* 1 سنوور، تخوب، سەرحەد، مەرز: *national boundaries* 2 پشتێنە، سەرحەد، کەرخ، ڕادە، هێڵی جیاکەرەوە: *boundary* *adj* سنووری، سەرسنوور *changes/disputes* ◇ *n* 1 مرز 2 سرحد، حد، محدوده *adj* مرزی

**boundary conditions** *noun*
(کیمیا) هەلومەرجی سنووری ◇ شرایط مرزی

**boundary surface** *noun*
(کیمیا) ئاست یا ڕووی سنووری ◇ سطح مرزی

**bounden**[1] /'baʊnd(ə)n/ *adjective*
پێبەند، دەربەست، ناچار، پێویست، :binding *our bounden duty* ◇ مقید، ناگزیر

**bounden**[2] /'baʊnd(ə)n/ *noun*, a (or one's) bounden duty
ئەرکی سەرشان یان ویژدانی، بەرپرسایەتی ناچاری یان زۆرەملێ: *our bounden duty* ◇ وظیفه‌ی اخلاقی، مسئولیت اجباری

**bounder** /'baʊndə(r)/ *noun*
بنیادەمی دیواندڕ، کەسێکی ناکارنزم، مرۆی هەرزەوسووک، خوێڕییە پیاو ◇ ادم فرومایه، آدم رذل

**boundless** /'baʊndləs/ *adjective*
بێ‌کۆتایی، بێ‌ئەندازە، بێ‌سنوور، لەڕادەبەدەر ◇ بی‌کران، بی‌حدومرز

**bounds** /baʊndz/ *noun, pl.*
1 پانتایی، بوار، مەڵبەند 2 ڕادەوسنوور ◇ 1 حوزه، گستره 2 حد، حدومرز

**bounteous** /'baʊntiəs/ *adjective*
1 زۆر، زەبەن، زەبەند، فراوان، :bountiful *a bounteous harvest* 2 دڵاوا، دەس‌ودڵ‌باز، بەدەهندە، بەرچاوتێر، بەخشندە، بەدەس‌ودڵ، بەخشندانە، دەسکراوانە ◇ 1 وافر 2 بخشنده، پرسخاوت، سخاوتمندانه

**bounteously** /'baʊntiəsli/ *adverb*

دەسـکراوانە، بەشـێوەیەکی بەخـشندە ◌ سخاوتمندانه

**bounteousness** /ˈbaʊntiəsnəs/ *noun*

1 بـەدەس‌ودڵـی، دلاوایـی، دەس‌ودڵ‌بـازی، بەدەهەندەیی، چاوتێری 2 زۆری، فراوانی ◌ 1 سخاوت 2 وفور

**bountiful** /ˈbaʊntɪfl/ *adjective*

1 زۆر، فراوان، abundant 2 بەدەهەندە، بەنان، دلاوا، دەس‌ودڵ‌باز، دەسکراوانە، بەخشندانە ◌ 1 وافر 2 باسخاوت، سخاوتمندانه

**bountifully** /ˈbaʊntɪfli/ *adverb*

دەسـکراوانە، بەشـێوەیەکی بەخـشندە ◌ سخاوتمندانه

**bounty** /ˈbaʊnti/ *noun, pl.* bounties

1 بەخـشندەیی، بەدەهنـدەیی، دلاوایـی، دەسکراوەیی، چاوتێری، بەدەس‌ودڵی. بەخشین 2 یارمـەتی، پیتـاک، کۆمـەک 3 ریـژەن، پیت، بەرەکەت، بەرە، پیت و بەرەکـەت، بـەروبووم، نیعمـەت 4 خـەلات (میری یـان حکومـەت)، پاداشـت 5 دیـاری 6 بـەروبوو، بەرهـەم ◌ 1 بخشندگی، سخاوت، بخشش 2 اعانـه 3 نعمـت 4 جایزه 5 هدیه 6 محصول

**bouquet** /buˈkeɪ/ *noun*

1 هوویزی، چەپکەگوڵ 2 بۆنی خۆش، بەرامە، لابانتە 3 پیاهەڵوتن، پەسن ◌ 1 دسـتەگـل 2 نکهت 3 تمجید

**bouquet garni** /ˌbu:keɪ gɑ:ˈni:, US gɑ:rˈni, boʊˌkeɪ/ *noun, pl.* bouquets garnis /ˌbu:keɪ gɑ:ˈni:, US gɑ:rˈni, US also boʊˌkeɪ/

(فەرەنسـی) چەپکـەگیایێ کـە دەیخەنـە نـاو توورەکەیەکی چکۆلانە بۆ لێنان و تامخۆش کردن ◌ بوکی گارنی

**bourbon** /ˈbɜ:bən, US ˈbɜ:rbən/ *noun*

پێرێتن، بۆربۆن (جۆرێ ویـسکی ئەمریکایی، لە گەنمەشامی و جۆفەرەنگی دەگیرێ) ◌ بوربون

**Bourbon** /ˈbʊəb(ə)n/ – reactionary (US)

**bourrée** *noun*

بۆری (سـەما، هەڵـپەرکێی و موسـیقای پێشووی فەرەنسی) ◌ بوری

**bourgeois** /ˈbʊəʒwɑ:, ˌbʊəˈʒwɑ: , US ˌbʊrˈʒ-, ˈbʊrʒ-/ *noun, adjective*

1 بـورژوا، دووکـاندار، کاسـب‌کـار، بـازاڕی، سەوداگەر، سەرمایەدار، بازێری 2 سەرمایەداری، بورژوایی، ئەندامی چینی نێوەڕاست 3 سـەربە چینی نێوەڕاست، پشتیوانی بەرژەوەندییەکانی سـەرمایەداری یـان کاپیتـالیزم (سیاسـەت) 4 ژیـن‌فرەهـێ خـۆش‌گـوزەران ◌ 1 بـورژوا، سـرمایەدار 2 سـرمایەداری 3 وابسـتە بـە طبقـەی متوسط، سودجو 4 مرفه

**bourgeoisie** /ˌbʊəʒwɑ:ˈzi:, US ˌbʊrʒ-/ *noun*

1 سەرمایەداری، بورژوازی 2 چینی نێوەڕاست یـان خـۆش‌گـوزەران، چـینی سـەوداگەر یـان بـازاڕی، چـینی سـەرمایەدار یـان کاپیتالیـست (سیاسـەت) 3 چینی سەردەستی سەرمایەدار کە چـینی کرێکـار دەچەوسـێنێتەوە (لـە بـیری مارکسیـستی‌دا) ◌ 1 سـرمایەداری، بـورژوازی 2 طبقەی متوسط 3 طبقەی سرمایەدار

**bourgeoisification** *noun*

بورژوایی‌کردن، کردنە بورژوایی ◌ بورژواسازی

**bourn**[1] /bɔ:n, US bʊən/ *noun*

چۆمەڵ، شەتاو، جۆگە ◌ نهر کوچک

**bourn**[2] /bɔ:n, US bʊən/ *noun*, also bourne

1 سنوور 2 مەبەست، ئامانج، شوێن‌مەبەست ◌ 1 مرز 2 هدف 3 مقصد

**bourrée** /ˈbʊəreɪ/ *noun*

جۆرێ سـەمای کـرژی فەرەنـسی، لـە gavotte دەچێ ◌ بوری

**bourse** /bʊəs/ *noun*

1 بورس، بازاڕی دارایی 2 کیف، جانتا، هەگبە ◌ 1 بورس 2 کیسه

**Boursin** /ˈbʊəsã, French buʀsɛ̃/ *noun*

بورسـین، بووسـا (= جـۆرێ پـەنیری نـەرمی فەرەنسی) ◌ بورسین

**bout** /baʊt:/ *noun*

1 لێهاتن، هێرش 2 ماوەی نەخۆشی 3 پێشبڕکێی شەڕەمـشت یـان زۆرانبـازی 4 چـەماوێ لـە لاتێکی فیۆلین یان ئامێرێکی تر ◌ 1 حمله 2 مدت زمان مریضی 3 مسابقەی بوکس یا کشتی 4 بوت

**boutade** /bu:ˈtɑ:d/ *noun*

(فەرمی) هەڵچوونی ناکاو ◌ فوران ناگهانی

**boutique** /bu:ˈti:k/ *noun*

بووتیک، دووکان (بنەڕەت: لە *apothēkē* یونانی "storehouse") ◌ بوتیک

**bouton** /ˈbu:tɒn/ *noun*

(توێکاری) دوگمە (بنـەڕەت: لـە فـەرەنـسی بـە واتای "button") ◌ بوتون

**boutu** /ˈbəʊtu:/ *noun*, also boto

جۆرێ دولفینی بۆر یان پەمەیی ئامازۆنی [*Inia geoffrensis*] ◌ بوتو

**bouvier** /ˈbu:vieɪ/ *noun*

جۆرێ سـەگی زلە و بەقەوەت، لە بنەڕەتا هی بێلژیک ◌ بوویر

**bouzouki** /bʊˈzu:ki/ *noun, pl.* bouzoukis

جۆرێ ماندۆلینی mandolin ملدرێژی یۆنانی ◌ نوعی ماندولین

**bovid** /ˈbəʊvɪd/ *noun*

گوانداریکی تیرەی مانگا (Bovidae) ◌ نوعی پستاندار از خانوادەی گاو

**bovine** /ˈbəʊvaɪn, US ˈboʊ-/ *adjective,*

*noun*
*adj* 1 مانگایی، گایی، گایانه، گاوەکی، لە تیرەی مانگا ( bovine malignant catarrhal fever : جـەوشـەن) 2 خـاو و گـەوج، گەوجانـە *n* گـا (بنەڕەت: لە late Latin *bovines* لە *bos*، *bov-* لاتین "(مانـ)گا "ox) ۞ *adj* 1 گـاوی 2 کنـد و احمق، احمقانە *n* ثور

**bovine spongiform** encephalopathy = BSE

**bovver** /'bɒvə, US 'bɑːvər/ *noun*
(ئافـەرمی، بریتانیـا) کەڵـەگایی، چەقوکێـشی، لاتبـــازاڕی، لاتی گـــەری، ئاژاوەگێـــری، گێرەشێوێنی ۞ قلدری، آشوب گری

**bow**[1] /bəʊ, US boʊ, baʊ/ *noun*
1 کـەوان، کەمـە، کەوانـە (نێـوان دوو سـەری کەوان: مـاڵ) 2 دەنووکـە، ئارشـە، ژێژەنە(ک) 3 نووشتانەوە، چەمانەوە، چەمینەوە، نووچ 4 گرێ قوڵـفە یـان خزیـو 5 پـاپیۆن 6 پەلکەزێرینـە، کۆلکەزێرینـە، کەسـکوسـۆر 7 بۆنووشـتانەوە، داهاتنەو بە نیشانەی ڕێز، کڕنۆش ۞ 1 کمـان، قوس 2 آرشە 3 انحنا، خمیـدگی 4 گـره لغزنـده 5 پاپیون 6 رنگین‌کمان 7 تعظیم

**bow**[2] /bəʊ, US boʊ, baʊ/ *noun*, also bows
بەشـی پێشـەوەی کەشتی یان بەلەم، پێش یان سنگی کەشتی یان بەلەم، لووتکەی کەشتی ۞ سینەی کشتی، دماغە

**bow and arrow** *noun*
تیر و کەوان ۞ تیر و کمان

**Bow Bells** *noun, pl.*
زەنگەکانی کڵێـەی سەینت مـاری لیبـۆو Mary Lebow لە لەندەن؛ لەبەر دەنگاوێژی زەنگدا ۞ لو بلز

**bowdlerism** *noun*
بژارگـــەری، بژارکـــاری، سانـــسۆرگەری ۞ سانسورگرایی

**bowdlerist** *noun*
بژارگەر، بژارکار، سانسۆرگەر ۞ سانسورگرا

**bowdlerization** *noun*
بژارگـــەری، بژارکـــاری، بەرهـــەمپـــشکێنی، سانسۆرکاری ۞ هرزەزدایی

**bowed** *adjective*
چەماوە، چەمیو، کۆماوە ۞ خمیده

**bowel** /'baʊəl/ *noun, adjective*
*n* 1 ڕیخۆڵـە 2 (bowels) دڵ، قـوولایی، نـاخ *adj* ڕیخۆڵـەیی ۞ *n* 1 روده 2 (در جمع) اعماق *adj* وابسته به روده

**bowel movement** *noun*
پیسایی کردن، ڕیان، دەس‌بەئاوگەیاندن، دانیشتن، خۆخاوێن‌کردنەوە، خۆخاڵی‌کردن ۞ تخلیه

**bower**[1] /'baʊə(r)/ *noun*
1 کـەپر، کولـک، سـابات 2 (وێژەیـی) ژووری تایبەتی خانم 3 ماڵ و کۆختەی هـاوینی یـان لە لادێ ۞ 1 سایەسار 2 بوور

**bower**[2] /'baʊə(r)/ *noun*
لەنگەری لووتکـەی کەشتی ۞ لنگـر دماغـەی کشتی

**bower**[3] /'baʊə(r)/ *noun*
ڤیۆلۆن‌ژەن ۞ ویولون‌نواز

**bowerbird** *noun*
(باڵـندەناسـی) باڵـندەکەپرە؟، باڵـندەی سـابات [خێـــزان Ptilonorhynchidae: چـــەنـــدین جۆرن] ۞ نوعی پرنده

**bowfin** /'bəʊfɪn/ *noun*
جـۆرێ ماســی ڕاوی ئـەمریکایی، دەتوانـێ تـا ماوەیێکی زۆر لە دەرەوەی ئاودا بژی [ *Amia calva*] ۞ نوعی ماهی

**bow front** *noun*
داهاتنـەوە یـان چـەمانـەوەی بـەشـی پێـشەوە، پێشی‌قـۆقزی، پێـشەوەقیتی یـان دەرپـەڕیـوی، پێشەوەکەوانی ۞ بو فرانت

**bow-fronted** *adjective*
بەشی پێشەوەی داهاتۆتەوە یان چەماوەتەوە، پێـشی‌قـۆقز، پێـشـەوەقیـت یـان دەرپـەڕیـو، پێشەوەکەوان ۞ بو فرانتید

**bowhead whale** /'bəʊhɛd/ *noun*
جـۆرێ نەهـەنگی ڕەشـی Arctic [ *Balaena mysticetus*] ۞ نوعی وال

**bowie knife** /'bəʊi/ *noun*
خەنجێر، خەنجەر، کێرد (دوودەم) ۞ دشنه

**bowing** *noun*
ژێژەنـەپیاهێنان، ئارشـەپیاهێنان (ڤیۆلـۆن) ۞ آرشەکشی

**bow-knot** *noun*
گرێی قوڵفە ۞ گره خفت

**bowl**[1] /bəʊl, US boʊl/ *noun*
1 کاسە، یەخنی‌کێش، جـام، بایـە، قـاپ، کاشی، دەفر، پیالە، تاس 2 قووڵایی، چاڵایی (کەوچک) 3 ئـامفی‌تیـاتر، سـتادیۆم (بۆ ڕووداوی وەرزشـی یان موسیقایی) 4 (جوگرافیا) گۆڵاوی سروشتی ۞ 1 کاسـه، ظـرف، قـدح 2 گـودی (قاشـق) 3 آمفی‌تئاتر، استادیوم 4 آبگیر طبیعی

**bowl**[2] /bəʊl, US boʊl/ *noun*
1 تـۆپی (داریـن) بۆلینـگ 2 (bowls) بـۆلز (یاری)، بۆلینگ، بۆلینگی سەرمێرگ ۞ 1 تـوپ بولینگ 2 (در جمع) بولینگ

**bowl capital** *noun*
سەرکۆڵی قاپی یان کاسەیی ۞ سرستون کاسه‌ای

**bow-legged** /ˌbəʊ 'legɪd, US ˌboʊ/ *adjective*
چەوێل، پێ‌کەوانی، پاکەوانی ۞ پاکمانی

**bow legs** *noun, pl.*
پێ‌چەوێلی، چەوێلی، پاچەوێلی، لاقی کـەوانی،

(بۆ genu varum (ئـەژنـۆلاری، ژێنوڤـارۆم دەرەوە چەماوەتەوە) ◌ پای کمانی

**bowler** /ˈbəʊlə(r), US ˈboʊ-/ *noun*
یاریزانی بۆلینگ، بۆلینگ‌باز ◌ بازیگر بولینگ

**bowler hat** *noun*, also bowler
کلاوی کاسەیی یان قاپی ◌ کلاه لگنی

**bowline** /ˈbəʊlɪn/ *noun*
1 گرێی ئالقە 2 گوریسی بادەوە، تەنافی چارۆکە ◌ 1 گره حلقه، گره خرگوشی 2 طناب بادبان

**bowling** /ˈbəʊlɪŋ, US ˈboʊ-/ *noun*
بۆلینگ، بـۆلین، گـۆدارین (یـاری‌یەکـە بـە گـۆی دارین) ◌ بولینگ

**bowling alley** *noun*
1 سالۆنی بۆلینگ 2 بۆلینگ‌خانە (خانووبەرەیێ کـە بـۆلینگی تیادەکرێ) ◌ 1 سـالن بولینـگ 2 ساختمان بولینگ

**bowling green** *noun*
یاریگایـەکی چیمـەنی بـۆ یـاری بـۆلز، مێرگـی بۆلینگ ◌ چمن بولینگ

**bowls** /bəʊlz/ *noun, pl.*
بۆلز (یاری) ◌ بولز

**bowman**[1] /ˈbəʊmən, US ˈboʊ-/ *noun, pl.* bowmen
سەوڵلێدەر یا سەوڵچی پێشەوە ◌ پاروزن مقدم

**bowman**[2] /ˈbəʊmən/ *noun, pl.* bowmen
تیراوێژ، تیرهاوێژ، تیرخەر، کەوانەوان ◌ تیرانداز

**Bowman's capsule** *noun*
کـــەپــــسوولی بۆومـــــەن: کـــــەپـــــسوولێکی جـووت‌دیـوارەی پـەردەئاسـای تـەنـک، دەوری glomerulus‌ی نێفرۆنی nephron‌بڕبڕەدارێکی داوە ◌ کپسول بُومن

**bow oar** *noun*
جێ‌سەوڵی پشتەوە ◌ بوءاور

**bowsaw** /ˈbəʊsɔː/ *noun*
مشاری کەوانی، هەرەکەوانی ◌ ارەی قوسی

**bowser** /ˈbaʊzə/ *noun*
تانکێری سووتەمەنی فڕۆکە یان دابین‌کردنی ئاو ◌ بوُسر

**bowshot** /ˈbəʊʃɒt/ *noun*
تیراوێژ، مەودای بڕینی تیر. تیربڕ، بڕی تیر ◌ تیررس

**bowsie** /ˈbaʊziː/ *noun, pl.* bowsies
(ئیرلەنـدی) کەسێکی سـەرپێچ یـان لـە چـینی خوارووی کۆمەڵگاوە ◌ آدم سرکش یا از طبقەی پایین جامعه

**bowsprit** /ˈbəʊsprɪt/ *noun*
دەنووکی کەشتی، کۆڵـەکەی پێشەوەی کەشتی ◌ منقار کشتی

**Bow Street Runner** /ˈbəʊ/ *noun*
(مێژوویی، نافـەرمی) پۆلیسی لەنـدەن ◌ پلـیس لندن

**bowstring** /ˈbəʊstrɪŋ, US ˈboʊ-/ *noun*
ژێی کەوان ◌ چِلّه، وتر کمان

**bow tie** /ˌbəʊ ˈtaɪ/ *noun*
پاپیۆن (لە شێوەی کەوان) ◌ پاپیون

**bow window** *noun*
پـــەنجێرەی خـــڕی دەرپـــەڕیو، پـــەنجێرەی دەرپەڕیوی کەوانی ◌ پنجرەی پیش‌آمدەی کمانی

**bow-wow** /ˈbaʊ waʊ/ *interjection, noun*
*interj* وشەی سـەگ بە زمانی منـاڵان، کـووچی، قـروســـــکە، حەپـــــە، وەڕەوەڕ *n* /ˈbaʊwaʊ/ (نافەرمی) سەگ ◌ *interj* واق‌واق *n* سگ

**bowyer** /ˈbəʊjə/ *noun*
کەوانـــەوان، کـــەوان‌ســـاز، کـــەوان‌فـــرۆش ◌ کمان‌ساز، کمان‌فروش

**box**[1] /bɒks, US bɑːks/ *noun, pl.* same or boxes
1 قوتو، قالب، کارتۆن، سنووق، مجری، سێپ 2 شوێنی دادیار (دادگا) 3 لۆژ یان باڵاجێ (شانۆ) 4 خانە، چوارگۆشە 5 سنووقی پۆست، سنووقی پۆسـتی 6 کیوسـکی تەلـەفون 7 تەلـەفزیۆن 8 قوتـوی شـەمچە یـان شـقارتە 9 کورسـی یـان سەندەڵـی کالیـسکەچی 10 کـوخ، کولیـت 11 مستێن، شەڕەمشت، مشـت‌بازی 12 (the box، Soccer) ناوچـەی پێنالـتی 13 penalty area قەڵـغانی پاراسـتنی ناوگەڵـی پیـاو لـە وەرزش‌دا، ب.ت. کریکێـت، ناوگـەڵ‌پـارێز 14 (نافـەرمی) قوز، شەرم ◌ 1 جعبه، قوطی. صندوق 2 جایگـاه (دادگاه) 3 لژ، مربع 4 صندوق پست، صندوق پستی 5 کیوسک تلفـن 6 تلویزیـون 7 قـوطی کبریـت 8 صندلی درشکه‌ران 9 کلبه 10 بوکس 11 محوطەی جریمه 12 بیضه‌بند 13 (عامیانه) کس

**box**[2] /bɒks, US bɑːks/ *noun*, also box tree
1 (دەوەن [*Buxus sempervirens*] یـــان درەخـــت [*Casearia praecox*] (ئـەمریکـای گەرمێنان) و جۆرەکانی تر]) شمشـاڵ، شمـشاد 2 داری شمشاد ◌ 1 شـمشاد، 2 چوب شـمشاد

**box**[3] /bɒks, US bɑːks/ *noun*
مـشت، مـــست، زللـە، شـەپلاخە، شـەقەزللە ◌ مشت، سیلی

**boxboard** *noun*
مقەبای قوتو ◌ مقوای جعبه

**box camera** *noun*
کـامێرای قوتـویی یـان سـنووقی، دووربـینی سنووقی ◌ دوربین جعبه‌ای

**box canyon** *noun*
(لـە ئـەمریکا) دەربەنـدی سـنووقی (باریـک و بن‌تەخت و لا ستوونی) ◌ کانیون جعبه‌ای

**boxcar** /ˈbɒkskɑː(r), US ˈbɑːks-/ *noun*
واگۆنی بارهەڵگر ◌ واگن باری

**boxed** /bɒkst, US bɑːkst/ *adjective*
قوتویی، سێپی، کارتۆنی، سنووقی ◌ جعبه‌ای

**Boxer** /'bɒksə(r), US 'bɑ:k-/ *noun*
مـــستەوان، ئەنـدامی تونـدی کۆمەڵـەی نهـێنی نەتەوەگـەری چـینی، لـە سـەدەی 19دا پـەرەی سـەند ۞ مشت‌زن

**boxer** /'bɒksə(r), US 'bɑ:k-/ *noun*
1 بۆکسێر، مشت‌باز، شەڕەمشت‌کار، مستەوان 2 جۆرێ رەگەزی سەگی دەستە، بە تووکی قاوەیی نەرمەوە ۞ 1 بوکسور 2 نوعی سگ

**boxers** = boxer shorts

**boxer shorts** *noun, pl.*
شۆرتی بۆکسێر ۞ شورت بوکسور

**boxfish** *noun, pl.* same or boxfishes
سنووقەماسی، جۆرێ ماسی دەریایی گەرمێنان [*Tetrosomus gibbosus* و جۆرەکانی تر] ۞ نوعی ماهی

**boxful** /'bɒksfʊl, US 'bɑ:ksfʊl/ *adjective*
پڕقوتوو، قوتوبەرە، پڕسنووقێ ۞ بە اندازەی یک جعبه

**boxing** /'bɒksɪŋ, US 'bɑ:ks-/ *noun*
شەڕەمشت، مشتێن، مشت‌بازی، لوکمانێ، مستێن، بۆکس، مستانێ ۞ مشت‌زنی، بوکس

**Boxing Day** *noun*
رۆژی دیاری، رۆژی پێشکەشی (پشووی گشتی بریتانی لە یەکەم حەوتووی دوای کریسمەس) ۞ روز هدیه

**boxing-glove** *noun*
لەپک یان دەسکێشی شەڕەمشت، دەسکێشی بۆکس ۞ دستکش بوکس

**boxing-match** *noun*
پێشبڕکێی شەڕەمشت، کێبڕکێی بۆکس ۞ مسابقەی بوکس

**box junction** *noun*
(لە بریتانیا) بۆکس جانکشن (شوێنێ کە دوو رێگا یەکتر دەبڕن یان پێک‌دەگەنەوە، بە هێڵی زەرد نیشاندار کراوە کە ماشینەکان نابێ رابوێستن) ۞ بوکس جانکشن

**box number** *noun*
ژمارەی سنووقی پۆستی ۞ شمارەی صندوق پستی

**box office** *noun*
(شوێنی) بلیت یان تیکێت‌فرۆشی ۞ باجه

**box pleat** *noun*
چینی دوولایی (دروومان) ۞ پیلی بوکس

**boxroom** *noun*
عەمار، کۆگا (لە ماڵدا)، دیوی یەکجار چکۆلە ۞ انباری

**box tree** = box2

**boxthorn** *noun*
جۆرێ دەوەنی دڕکاوی، بەرێکی سوور دەگرێ [توخم *Lycium*: چەندین جۆرن] ۞ نوعی بوته

**box turtle** *noun*
کیسەڵی سنووقی یا قوتویی [توخم *Terrapene*:
چەندین جۆرن] ۞ لاک‌پشت جعبەای

**boxty** /'bɒksti/ *noun*
جۆرێ نانی ئیرلەند، ئارد و پەتاتەی کاڵی تیایە ۞ نوعی نان

**boxwood** /'bɒkswʊd, US 'bɑ:ks-/ *noun*
داری شمشاد ۞ چوب شمشاد

**boxy** /'bɒksi, US 'bɑ:ksi/ *adjective* (boxier, boxiest)
1 سنووقی، چوارگۆشە، قوتوویی 2 تەنگ، تەنگەبەر، چکۆلە، تەسک ۞ 1 جعبەای 2 تنگ

**boy** /bɔɪ/ *noun, interjection*
*n* 1 پس، کوڕ، لاو، بەچە، کوڕیژگە، منالکار، کوڕەکان (boys) 2 شاگرد، بەردەست، نۆکەر *interj* شا، تەح، ئاخ، وەی، یاح ۞ *n* 1 پسر، پسربچه، بروبچەها 2 پادو *interj* آوی، عجب

**boyar** /bəʊ'jɑ:/ *noun*
ئەندامی چینی ئەریستوکراتی کۆنی رووسیا، نزیک بە میر ۞ بویار

**boycott** /'bɔɪkɒt, US -kɑ:t/ *noun*
بایکوت، بەربەند (کردن؛ *n* boycotter) ۞ تحریم، بایکوت

**boyfriend** /'bɔɪfrend/ *noun*
1 دۆستی کوڕ، رفیقی کوڕ 2 گراو، یار ۞ 1 دوست‌پسر 2 معشوق

**boyhood** /'bɔɪhʊd/ *noun*
(قۆناخ یان سەردەمی) منالی، کوڕێتی، کوڕینی ۞ دوران بچگی

**boyish** /'bɔɪɪʃ/ *adjective*
کوڕانە، وەکوو کوڕان، منالانە: *boyish charm/enthusiasm* ۞ پسرانه

**boyishly** /'bɔɪɪʃli/ *adverb*
کوڕانە ۞ پسرانه

**boyla** /'bɔɪlə/ *noun*
پزشکی جادووگەری رەسەن‌نشینی ئەوسترالیا (بنەڕەت: لە *Nyungar bolya*) ۞ بویلا

**Boyle's law** *noun*
(کیمیا) قانوونی بۆیل ۞ قانون بویل

**boyo** *noun, pl.* boyos
(نافەرمی. ئیرلەند و وێلز) کوڕ یان پیاو ۞ پسر یا مرد

**Boy Scout** *noun*
پێشەنگی کوڕ ۞ پیشاهنگ پسر

**boysenberry** /'bɔɪz(ə)n,b(ə)ri, US -,beri/ *noun, pl.* boysenberries
1 میوەیێکی زلەی خۆراکی توودڕک‌ئاسا 2 دەوەنێکی متوربەکراوی ئەو بەرە [*Rubus loganobaccus*] ۞ بویسنبری

**boy wonder** *noun*
لاوی بەبەهرە و هەڵکەوتوو ۞ نوجوان مستعد استثنایی

**bozo** /'bəʊzəʊ, US 'boʊzoʊ/ *noun, pl.*

bozos

(ئافەرمی، ئەمریکا) مرۆی گەوج (و بێ‌خێرە) ◌ آدم احمق

**BP** *abbreviation* 1 British Petroleum 2 blood pressure 3 before the present (era)

**B Phil** *abbreviation* Bachelor of Philosophy

**Bq** *abbreviation* becquerel

**Br** *abbreviation* 1 British 2 Brother

1 بریتانی 2 برادەر، برا (ئایینی) ◌ 1 بریتانیایی 2 برادر

**Br** symb. the chemical element bromine

**bra** /brɑː/ *noun*

مەمک‌بەند، سینەبەند، شاماکی (braless *adj*) ◌ کرست

**braata** /'brɑːtə/ *noun*, also braatas

(لەنێو سوورپێستەکاندا) سلاودانەوە، پارسەنگ، خاترانە ◌ برات

**brace** /breɪs/ *noun*

1 بەست، بەند، پێکبەست، هەڵپێکە، لێک‌هەڵپێک، لێکبەست 2 تەناف یان گوریسی بادەوە 3 مەهار، راگر، راگیرە، پاڵپشت 4 ئاکۆلاد، برۆنیشان { } 5 جووت، مۆت، دوانە 6 (لە شکستەبەندی‌دا) میل، میلە 7 (ددانسازی) تێل، سیم، وایەر 8 (braces) دۆخین، بەتەخوێ، بەتەشەڵوار، بەند یان بەستی شەڵوار ◌ 1 بند 2 طناب بادبان 3 مهار 4 آکولاد 5 جفت 6 میل 7 سیم 8 (در جمع) بند شلوار

**brace and bit** *noun*

برغوو، بورغو، سمۆی دار، چێوسمۆ ◌ متەی چوب

**bracelet** /'breɪslət/ *noun*

1 بازنە 2 دەزبێن، دەسبێن، دەزبەند 3 بازوڵەبەند 4 (bracelets) کەلەپچە، دەس‌بەست، دەسبێن (پۆلیس، بنەرەت: لە فەرەنسی کۆن، لە bras "arm"، لە bracchium لاتین) ◌ 1 النگو 2 دستبند 3 بازوبند 4 (در جمع) دستبند

**bracer** *noun*

1 مەچەک‌بەند، قۆڵبەند، قۆڵەوان (لە تیرخستن و وەرزش‌دا) 2 (مێژوویی) زرێی قۆڵ، قۆڵەوانە ◌ 1 حایل مچ 2 زره بازو

**brach** /brætʃ/ *noun*

تانجی مێ، تاژی دێڵ، دێلەتاجی ◌ تازی ماده

**brachial** /'breɪkɪəl/ *adjective*

قۆڵی، باسکی، باڵی، بازوڵەیی، سەربە باسک یان قۆڵ ◌ وابسته به بازو

**brachial artery** *noun*

خوێنبەری باسک(ی) ◌ شریان بازو

**brachiate** /'brakɪət, US 'breɪk-/ *adjective*

1 (زیندەناسی) لق‌وپۆدار، بەپەل‌وپۆ، پڕلق‌وپۆ 2 قۆڵدار، خاوەنی قۆڵ ◌ 1 شاخەدار 2 دارای بازو

**brachio-** *prefix*

پێشگر: 1 قۆڵ، باسک، باڵ، بازوڵە: 2 *brachial* باسکی یان قۆڵی و... (بنەرەت: لە *brakhiōn* یۆنانی‌یەوە "arm") ◌ پیشوند: 1 بازو، عضد 2 بازویی و

**brachiocephalic artery** – innominate artery

**brachiopod** /'brakɪə(ʊ)pɒd/ *noun*

گیانەوەری بێ‌قۆڵ یان قۆڵپا یان پاقۆڵ ◌ جانور بازوپا

**Brachiopoda** /ˌbrakɪə'pəʊdə/ *noun, pl.*

بێ‌قۆڵان، قۆڵپایان (لقێ کە lamp shell ـەکان دەگرێتەوە) ◌ بازوپایان

**brachiosaurus** /ˌbrakɪə(ʊ)'sɔːrəs/ *noun*

قۆڵە(مار)مێلکە: جۆرێ دایناسۆری کەتەی گیاخۆری دوایی‌یەکانی قۆناخی ژووراسیک و نیوەڕاستی کریتاسە، بە ملێکی زۆر درێژ و دەستی درێژتر لە لاقی (لە *brakhiōn* یۆنانی "arm" + *sauros* "lizard") ◌ نوعی دایناسور

**brachium** *noun*

باسک، قۆڵ، باڵ، بازوڵە ◌ بازو، عضد

**brachy-** /'braki/ *prefix*

پێشگر: کورت، قوڵە، قوڵ: *brachycephalic* (بنەرەت: لە *brakhus* یۆنانی‌یەوە "short") ◌ پیشوند: کوتاه

**brachycephalic** /ˌbrakɪsɪ'falɪk, US -kɛ'falɪk/ *adjective*, also brachycephalous

سەرکورت، سەرپان ◌ کوتاه‌سر

**brachycephaly** *noun*

سەرکورتی، سەرپانی ◌ دارای سرکوتاه بودن

**brachycranical** *adjective*, also brachycranic

کاپۆڵ‌کورت، کەللەکورت، کەڕاکەکورت، کەسێ کاسەسەری کورت بێ ◌ دارای جمجمەی کوتاه

**brachycrany** *noun*

کاپۆڵ‌کورتی، کەللەکورتی ◌ دارای جمجمەی کوتاه بودن

**brachydoctylous** *adjective*

پەنجەکورت، قامک‌کورت، ئەنگوست‌کورت ◌ دارای انگشتانی کوتاه

**brachydoctyly** *noun*

پەنجەکورتی، قامک‌کورتی ◌ دارای انگشتان کوتاه بودن

**bracing** /'breɪsɪŋ/ *adjective*

خۆش، سازگار، بەجۆش‌هێنەر، شادی‌هێن، بەگوڕێنەر، بووژێنەر: *a bracing breeze* (bracingly /'breɪsɪŋli/ *adv*) ◌ فرح‌بخش

**brack** *noun*

(ئیرلەندی) کەیکی میوەدار ◌ کیک میوەدار

**bracken** /'brækən/ *noun*

جۆرێ فێرنی درێژ، باوەشێنەگیا؟ [ *Pteridium aquilinum* ] ◌ سرخس

**bracket** /'brækɪt/ *noun*
1 گۆشــــەڕاگر، گۆشــــەبەند، ســــووچبەنــــد، گوشەبەست، ڕەفحەبەند، ڕەفحەڕاگر، باڵپشتی ڕەفحــە، تــاق، تاقــە 2 دیــواری 3 کــەوانڕێــک، ئانیشکە، کەوانە، بزنیشان، نیشانەکانی {} [ ] ( ) < > 4 دەســـتە، کۆمـــەڵ، پــۆل 5 پۆلانـــدن، دەســـتاندن، دەســـتەکردن، دەستەدەســـتەکردن 6 (میلیتاری) مەودای نێوان دوو گوللە تۆپی تەقیو لەمبەر و لەوبەری نیشانەوە ◌ 1 پایەی سەگوش، طاقچـە 2 دیوارکـوب 3 قـلاب، آکـولاد، پرانتـز 4 گروه، رده 5 طبقەبندی 6 براکت
**bracketed** *adjective*
لەنێو کەوانێک یان کەوانەدا، لەنێو ئانیشکەدا ◌ داخل کروشە یا پرانتز
**brackish** /'brækɪʃ/ *adjective*
1 کەمێ سوێر، کەمسوێر، دەمی سوێری هەیە، تاڵ: *brackish water* 2 (تام) ناخۆش، بێتام، بێمەزە ◌ 1 لبشور 2 بدطعم
**brackishness** *noun*
1 کەمێ سوێربوون، دەمی سوێری هەبوون، تاڵی 2 ناخۆشی، بێتامی، بێمەزەیی ◌ 1 لبشـوری 2 بدطعمی
**braconid** /'brakənɪd/ *noun*
(مێروناســی) جــۆرێ هەنگەژاڵــە wasp ی مــەخۆری چکۆلـەی خێزانی (Braconidae) پێوەنـدی بــە ichneumon ــەکانــەوە هەیــە ◌ براکونید
**bract** *noun*
(ڕووەکناســی) گــەڵاچ(ـکــ)ەی؟ ژێرگــوڵ (bracted *adj*: بنەڕەت: لە *bractea* لاتین "تۆێ یان وەرەقی ناسکی کانزا") ◌ برگە
**bracteal** *adjective,* also bracteate /'braktɪət, US -tɪeɪt/ or bracted
گەڵاکدار، بەگەڵاک ◌ دارای برگە
**bracteole** *noun,* also bractelet
لاگەڵاچـە، گەڵاچـەی لاوەکی، گەڵاچکیلـە ◌ برگەی کوچک
**bractless** *adjective*
بێگەڵاچەی؟ ژێرگوڵ، گەڵاچەی ژێرگوڵی نییە ◌ بدون برگە
**brad** /bræd/ *noun*
بزماری بێسەر، پین ◌ پین، میخ بیسر
**bradawl** /'brædɔ:l/ *noun*
درەوشە (نووکپان یان سەرپان) ◌ درفش
**bradycardia** /,bradɪ'kɑ:dɪə/ *noun*
(پزشکی) دڵەخاوی، خاوبوونەوەی نائاسایی دڵ ◌ برادیکاردیا
**bradykinin** /,bradɪ'kʌɪnɪn/ *noun*
(زیندەکیمیا) ئاوێتەیێ کە لە خوێندا ئازاد دەبێ و دەبێتە هۆی چوونەیەکی ماسوولکەی لووس smooth muscle و کشان یان هەراوبوونەوەی dilation ڕەگەکانی خوێن (بنەڕەت: لە یۆنانی "خاو" + *kinēsis* "جووڵە، جم" + -in[1]) ◌ برادیکینین
**brae** /breɪ/ *noun*
(لە سکاتلەند) تەپۆڵکە یان گردی تەلان (یان لێژ) ◌ تپەی شیبدار
**Braeburn** /breɪbə:n/ *noun*
جۆرێ سێوی دیسێری نیوزیلەند کە گۆشتەکەی تورتە ◌ بریبرن
**brag** /bræg/ *noun*
1 حــەیتوحــووت، هاڕەوگێفــە، لافوگــاف، لافانــدن، فڕوفیــشاڵ(کــردن) 2 جــۆرێ poker ئاسانکراو یان سادە ◌ 1 لافزنی 2 براگ
**braggadocio** /,brægə'dəʊtʃɪəʊ, US -'dəʊtʃɪoʊ/ *noun*
1 بڕەگەدوشیو، خۆهەڵکێش، لافچی، لافباز 2 حــەیتوحــووت، لافوگــاف، هاڕەوگێفــە، فڕوفیشاڵ(کردن) ◌ 1 لافزن 2لافزنی، رجزخوانی
**braggart** /'brægət, US -gərt/ *noun*
بنیــادەم یــان مــرۆی بەهاڕەوگێفــە، کــەسێکی خۆهەڵکێش یان لافباز، ترلێدەر ◌ آدم لافزن
**Brahman** /'brɑ:mən/ *noun, pl.* Brahmans
1 ئەندامی بــەرزترین چین یــان کاستی هیندی بڕەهمەن کە بریتییە لە پیاوانی دینی 2 خودای خولــقێنەری ســیانەی هینــدی (بروانــە Shiva و Vishnu) 3 کەسێکی بەرز (لەباری کۆمەڵایەتی و چاندییەوە) = US spelling of 3 Brahmin ◌ zebu = Brahmin برهمن
**Brahmana** /'brɑ:mənə/ *noun*
(لە هیندوئیزمدا) هەریەک لە لێکدانەوە یان ڕافە دووروودرێژەکان لەسەر ڤیداکاندا ◌ برهمانا
**Brahmanism** /'brɑ:mə,nɪz(ə)m/ *noun,* also Brahminism
شێوەی سەرەتای هیندوئیزم کە لە هیندووستان (900 پێشزایین) لەژێر کاریگەری برەهمانەکان سەری هەڵدا ◌ برهمنیسم
**brahmaputra** /,brɑ:mə'pu:trə/ *noun*
مریشکێکی زلە لە ڕەگەزی ئاسیایی (بنەڕەت: لە ناوی *Brahmaputra* ناوی ڕووبارێکی ئاسیای باشووری) ◌ برهماپوترا
**Brahmin** /-ɪn/ = Brahman
**Brahms and Liszt** *adjective*
(بریتانیا و نافەرمی) مەست، کـەیل، کەلـەلا ◌ مست
**Brahui** /brə'hu:i/ *noun, pl.* same
1 ئەندامی خەڵکی لادێیی ڕۆژاوای پاکستان 2 زمانی دراڤیدی Dravidian ئەو گەلە ◌ براهونی
**braid** /breɪd/ *noun*
1 پەلکە 2 شریت، باریکە، پەلکەڕەنگینە، بەنۆکە، قــەیتان، پــەلک، پــەراوێز، زنجیرە، گولابــاتون، سەردروو ◌ 1 گیس 2 قیطان، نوار، گلابتون

**braided** *adjective*
زنجیرەریز، زنجیرەچن‌کراو، سەردرووکراو، باریکە یان پەلک‌پیادووراو ۞ نواردوزی‌شده
**brail** *noun*
گوریس یان تەنافی هەلکردنی بادەوەی کەشتی ۞ برایل
**Braille** /breɪl/ *noun*
هێلی بریل، هێل یان ئەلفوبێی بریل ۞ بریل
**brain** /breɪn/ *noun*
1 مێشک، مێژەلاک، مەژی، مێژی 2 مۆخ، دەماخ، عەقل، ئاوەز، هۆش 3 تێگەیشتن 4 مرۆی زیرەک و بەهۆش، بیریار، هزرڤان 5 (brains) مێشک، مەغز (بۆ خواردن) 6 (نافەرمی) ڕێکخەری سەرەکی، زیرەک (لە گروپێکی تایبەتی‌دا) ۞ 1 مغز 2 مخ، عقل، ذهن 3 فهم 4 انسان بافراست، آدم متفکر 5 (در جمع) مغز 6 مغز متفکر
**brainbox** /'breɪnbɒks, US -bɑːks/ *noun*
(بریتانیا و نافەرمی) کەسێکی یەکجار زیرەک ۞ آدم بافراست
**braincase** = cranium
**brainchild** /'breɪntʃaɪld/ *noun, pl.* brainchildren
1 بیر، هزر، بیرۆکە، ئایدیا 2 داهێنان ۞ 1 اندیشه، ایده 2 ابداع، ابتکار
**brain damage** *noun*
لێدانی مێشکی، گورزی مێشکی، لێکەوتنی مێشک ۞ ضربه‌ی مغزی
**brain-damaged** *adjective*
مێشک‌نیش‌پێ‌گەیشتوو، لێدراوی مێشکی ۞ ضربه‌دیده‌ی مغزی
**brain death** *noun*
مردنی مێشک یان مێشکی ۞ مرگ مغزی
**brain drain** *noun*
(نافەرمی) کۆچی مێشکەکان، ڕۆیشتنی مێشکەکان ۞ فرار مغزها
**brainfever bird** *noun*
جۆرێ بازی هیندی و سریلانکایی [*Cuculus varius*] ۞ نوعی باز
**brainiac** *noun*
(نافەرمی، ئەمریکا) کەسێکی یەکجار زیرەک ۞ مغز متفکر
**brainless** /'breɪnləs/ *adjective*
گەوج، بێ‌مێشک، بێ‌مەژگ، پەلحە، دەبەنگ ۞ احمق، نفهم
**brainlessly** /'breɪnləsli/ *adverb*
گەوجانە، بێ‌مێشکانە، دەبەنگانە ۞ احمقانه
**brainlessness** /'breɪnləsnəs/ *noun*
گەوجی، بێ‌مێشکی، پەلحەیی، دەبەنگی ۞ حماقت، نفهمی
**brainpan** /'breɪnpæn/ *noun*, also skull
(نافەرمی) کاسەسەر، کاپۆلک، کەراکە، کەللە، قاف ۞ جمجمه
**brainpower** /'breɪnpaʊə(r)/ *noun*
1 زیرەکی، بەهۆشی، توانایی بیرکردنەوە 2 بیریاران، بیرمەندان ۞ 1 نیروی تفکر، فراست 2 متفکران
**brainstem** *noun*
(توێکاری) پایەمێشک، پایە یان قەدی مێشک: پایە یان قەدی ناوەندی مێشکی گوانداران، لە medulla oblongata و پردە pons و مێشکی نێوەڕاست midbrain پێکهاتووە ۞ برین‌استم
**brainstorm**/'breɪnstɔːm, US -stɔːrm/ *noun*
1 تێکچوونی هۆشی و بیری، شلەژانی دەروونی، شێتی کورت‌ماوە و ناکاو 2 بیری نوێ، فکری تازە ۞ 1 اختلال روانی و فکری، اختلال روانی و ناگهانی 2 فکر بکر
**brainstorming** /'breɪnstɔːmɪŋ, US -stɔːrm-/ *noun*
چارەسەرکردنی بەکۆمەڵ، گەلەچارەسەری، شێواز یان مێتۆدی چارەسەرکردنی بەکۆمەڵ ۞ روش مشکل‌گشایی گروهی
**brains trust** *noun*
کۆمەڵی شارەزا یان پسپۆڕان (لە وەلام و پرسیار و ڕاوێژکاری‌دا) ۞ گروه کارشناسان
**brain-teaser** *noun*, also brain-twister
(نافەرمی) مامک، مەتەڵ، مەسیلە، پرسیاری سەخت: *There were some real brain-teasers in the quiz* ۞ معما
**brainwashing** *noun*
مێشک‌شتنەوە، مێشک‌شۆردنەوە: *the victims of -washing and torture* ۞ شستشوی مغزی
**brainwave** /'breɪnweɪv/ *noun*
1 بیری نوێ، هزری تازە، بیری باشی کت‌وپڕ، بیرۆکەی زیرەکانە 2 پەیام یان سیگنالێکی ئێلێکتریکی لە مێشک‌دا، شەپۆلی مێشکی ۞ 1 فکر بکر 2 علامتی الکتریکی در مغز
**brainy** /'breɪni/ *adjective* (brainier, brainiest)
زیرەک، بەمێشک، پڕمێشک، بەزەین ۞ باهوش
**brake**[1] /breɪk/ *noun*
1 وەستێنە 2 بەربەست، لەمپەر، تەگەرە، کۆسپ ۞ 1 ترمز 2 مانع
**brake**[2] /breɪk/ *noun*
(مێژوویی) عەرەبانەیێکی ئەسپی چوارپێچکەیی ۞ نوعی کالسکه
**brake**[3] /breɪk/ *noun*
1 شانە، دەفە (کەتان و گوش) 2 دەزگایێکی قورس کە جاران بۆ شکاندنی کولۆی زلە بەکاریان دێنا، مالووی ئاسن، کولۆشکێن، کولۆکوت brake harrow ۞ 1 شانه 2 بریک
**brake**[4] /breɪk/ *noun*

(کۆن و ویژەیی) بێشە، چوغورد، تەرت ۞ بیشه
**brake**[5] /breɪk/ *noun*
1 سەرەخسی fern زبری ولاتە گەرمەکان [توخم *Pteris*] 2 وشەیەکی کۆن بۆ bracken ۞ بریک
**brake**[6] = archaic past of break
**brake disk** *noun*
پەیکە یان دیسکی وەستێنە ۞ دیسک ترمز
**brake drum** *noun*
تەپلە یان کاسەی وەستێنە ۞ کاسەی ترمز
**brake fluid** *noun*
رۆنی وەستێنە (شلەیێ کە وەستێنە هیدرۆلیکییەکان بەکاری دێنن) ۞ روغن ترمز
**brake harrow** = brake3
**brake-horsepower** *noun*
هێز یان کێشی راستەقینە (مۆتۆر) ۞ قدرت مفید
**brake lever** *noun*
وەستێنەی دەستی ۞ ترمز دستی
**brake light** *noun*
چرای وەستێنە ۞ چراغ ترمز
**brakeman** *noun, pl.* brakemen
1 بەرپرسی وەستێنەری شەمەندەفەر، شاگرد شۆفیر 2 بەرپرسی وەستێنەی bobsliegh ۞ 1 متصدی ترمز ترن 2 متصدی ترمز bobsliegh
**brake pedal** *noun*
پایەی وەستێنە، پێیە یان جێپێی وەستێنە، پێدالی وەستێنە ۞ پدال ترمز
**brake-shoe** *noun*
کەوشۆکە یا پێلاوکەی وەستێنە ۞ کفشک ترمز
**bramble** /ˈbræmbl/ *noun*
دەوەنی تووودڕکی، دڕکەدەوەن، دەوەنێکی دڕکاوی ۞ برامبل
**bramble shark** *noun*
جۆرێ شارک یان کوسەی کەتە و رەنگماتی گەرمێنانی ئەتلانتیک [*Echinorhinus brucus*] ۞ نوعی کوسه
**brambling** /ˈbramblɪŋ/ *noun*
جۆرێ سەیرەی پاشەڵسپی، سەربە یان پێوەندی بە chaffinch ەوە هەیە [*Fringilla montifringilla*] ۞ برامبلینگ
**brambly** /ˈbræmbli/ *adjective*
پڕدڕکەدەوەن ۞ برامبلی
**bran** /bræn/ *noun*
سۆست، سۆ، سوس، زبرە، کریک، کەلپ، درشتەی ئارد، کەپەک، پاژینە، ئەسپرزە، پشی، پنس: *breakfast cereal that contains bran* ۞ سبوس
**branch** /brɑːntʃ, US bræntʃ/ *noun, adjective*
*n* 1 لک، لق، تا، لپ، فاق، تاقیشک، قەلبە، لەژگ، نیهال، قیت، گلم، شاخ(ە) 2 لک، لق، بەش، پشک، کەرت *adj* لاوەکی (بنەرەت: لە late *branca* فەرەنسی کۆن، لە *branche* Latin "چرنووک، پەنجە paw") ۞ *n* 1 شاخه 2 شعبه، بخش *adj* فرعی
**branched** *adjective*
لقوپۆدار، بەپەلوپۆ، پڕلقوپۆ ۞ شاخه‌دار
**branchia** /ˈbraŋkɪə/ *noun, pl.* branchiae /-kɪiː/
شیپەرە، گوێچکەماسی، گوێماسی، هەناسەکێش، شیپەرەی ماسییەکان و هێندێ لە بڕبڕەداران ۞ آبشش، آبشش ماهی‌ها و برخی از مهره‌داران
**branchial** *adjective*
شیپەرەیی، سەربە گوێچکەماسی یان هەناسەکێش ۞ وابسته به آبشش
**branchiopod** *noun*
گیانەوەرێ لە دەستەی Branchiopoda ۞ برانکیوپود
**Branchiopoda** /ˌbraŋkɪəˈpəʊdə/ *noun, pl.*
شیپەرەپایان، شیپەرەپێیان، هەناسەکێشپایان، دەستەیێ لە گیانەوەرانی وردی ئاوی کە شیپەرە یا هەناسەکێشەکەیان لەسەر پێیانە، کێچە ئاوی water flea و fairy shrimp ەکان دەگرێتەوە (بنەرەت: لە یونانی، *brankhia* "شیپەرە، هەناسەکێش" + *pous, pod* "پا") ۞ برانکیوپودا
**branchlike** *adjective*
لقئاسا، لقی، شێوەلک ۞ شاخه‌مانند
**branchlet** /ˈbrɑːtʃlɪt, US ˈbræntʃlɪt/ *noun*
چل، پژ، حاچە، قیتک، لقۆچکە ۞ شاخه‌ی کوچک
**branch line** *noun*
هێڵی لاوەکی (رێی ئاسن) ۞ خط فرعی
**brand** /brænd/ *noun*
1 نیشانە، دروشم (بازرگانی)، دروشم، نیشانک، نیشانە، برەند، جۆری تایبەت 2 داخ، چزان، هاوید، میل یان ئاسنی داغ، هەرەزینگ، شیشی داغ یان چزاندن 3 سەرەبزووت، سووتەمەرۆ، بزووت (دار) 4 (ویژەیی) شمشێر، شیر 5 نیشانە، دروشم، درف 6 چۆلەچرا، مەشخەڵ، مێلەدە 7 داخ، پینە، لکە یان پەڵەی بێئابروویی، عەیب (ئەڵمانی بنەرەت) ۞ 1 مارک، علامت، نوع، نوع خاص 2 داغ، آهن داغزنی 3 چوب نیمسوز 4 شمشیر 5 انگ 6 مشعل 7 داغ ننگ
**brandade** /brɒ̃ˈdɑːd/ *noun*
جۆرێ چێشتی Provençal ۞ نوعی غذا
**branded** /ˈbrændɪd/ *adjective*
مارکدار، نیشانەدار ۞ دارای مارک
**branding iron** /ˈbrændɪŋ aɪən/ *noun*
میل یا ئاسنی داغ، داغاسن، هەرەزینگ، میلەداخ، ئاسنەداخ ۞ آهن داغ
**brand leader** *noun*
پڕفرۆشترین بەرهەم لە جۆری خۆیدا ۞ براند لیدر

**brandling** *noun*, also tiger worm
کرمەبەورە: جۆرێ کرمی سووری نیوگڵ، وەک کۆمپۆست یان چەشتەی ماسیگران بەکاردێترێ [*Eisenia fetida*] ◌ نوعی کرم
**brand name** *noun*
نیشانک، مارک، نیشانەی بازرگانی، دروشمی بازرگانی ◌ آرم
**brand-new** *adjective*, also brand new
نەوی نەو، هەرەتازە، لاکومۆر، نوونتیانەبوو، بێنوون ◌ کاملاً نو
**brandy** /'brændi/ *noun*, *pl.* brandies
براندی، براندیخۆری، لیوانی براندی ◌ براندی، گیلاس براندی
**brandy butter** *noun*
جۆری سۆسی توندی براندی، کەرە و شەکر ◌ نوعی سس
**branks** /braŋks/ *noun*, *pl.*
(مێژوویی) لەغاوی ژنی دەمدرێژ (بۆ سزادان) ◌ برانکس
**branle** /'bran(ə)l/ *noun*
جۆرێ سەمای سەدەی 16ی لە بنەڕەتا فەرەنسی ◌ نوعی رقص
**bran-new** = brand-new
**branny** *adjective*
کەپەکاوی، زبرەدار، سۆسناسا ◌ نخالەدار، نخالەمانند
**brant** = brent goose
**brash**[1] /bræʃ/ *adjective*
1 بێشەرم، ڕوودار، ڕووهەڵماڵراو، نەترس، ئازا: *a brash adventurer* 2 بەپەلە، بەپرتاو (brashly /bræʃli/ *adv*: نەترسانە، ئازایانە) ◌ 1 وقیح، بی‌پروا، جسور 2 شتاب‌زده
**brash**[2] /bræʃ/ *adjective*
زووشکێن، قرپ، ناسک: *brash wood* ◌ ترد
**brashness** /bræʃnəs/ *noun*
بێشەرمی، ڕووداری، ڕووهەڵماڵراوی، نەترسی ◌ وقاحت، جسار
**brass** /brɑ:s, US bræs/ *noun*, *adjective*
*n* 1 زەرد، برنج، کالان 2 کەلوپەل یان شتومەکی لە زەرد 3 ئامێرە زەردەکان 4 (نافەرمی) پارە، پوول 5 ڕووداری، بێشەرمی 6 (نافەرمی) = top brass *adj* لە زەرد ◌ *n* 1 فلز برنج 2 ابزار برنجی 3 سازهای برنجی 4 پول 5 وقاحت *adj* برنجی
**brassage** /'bræsɪdʒ/ = seigniorage
**brassard** /'brasɑ:d/ *noun*
1 (مێژوویی) زرێی بازوولە یان قۆڵ، قۆڵەوانە 2 بازووبێن، قۆڵبێن ◌ 1 زره بازو 2 بازوبند
**brass band** *noun*
سازبەندی زەرد ◌ گروه‌نوازندگان سازهای برنجی
**brassed off** *adjective*
بێزراو، وەڕەز، جاڕز، عاجز ◌ خسته، دمغ
**brass hat** *noun*
1 ئەفسەری پایەبەرز لە ئەرتەشدا 2 هەر کەسێکی گرنگ، کەڵلەفیل، کەلەکەر ◌ 1 افسر ردەبالا 2 آدم کله‌گنده
**brasserie** /'bræsəri, US ˌbræsə'ri:/ *noun*, *pl.* brasseries
بارسێری (= جۆرێ خواردنگە کە بیرە و خۆراکیش دەدا) ◌ براسری
**brass hat** *noun*
(نافەرمی، بریتانیا) ئەفسەری پایەبەرزی هێزە چەکدارەکان ◌ افسر عالی‌رتبه‌ی نیروهای مسلح
**brassica** /'brasɪkə/ *noun*
کەلەمە (بنەڕەت: لە لاتینەوە "cabbage")، گیای تیرەیێ کە بریتین لە: rape ،swede ،cabbage و mustard [تۆخم *Brassica*] ◌ نوعی گیاه
**brassiere** /'brazɪə, US 'brazɪə:/ = bra
**brassily** /'brɑ:sili, US 'bræsili/ *adverb*
بێشەرمانە، ڕوودارانە ◌ وقیحانه
**brassiness** /'brɑ:sinəs, US 'bræsinəs/ *noun*
ڕووهەڵماڵراوی، بێشەرمی ◌ وقاحت
**brass knuchkles** = knuckleduster
**brass plate** *noun*
تابلۆی یان پلێیتی لە زەرد ◌ پلاک برنجی
**brass tackes** *noun*, get down to brass tacks
ڕاستییە بنەڕەتییەکان، چوونەسەر باسی سەرەکی، ڕاستییەکان ◌ حقایق اساسی
**brassware** *noun*
1 کەلوپەلی لە زەرد 2 قاپوقاچاخ یا حاجەتی لە زەرد ◌ 1 ابزار برنجی 2 ظروف برنجی
**brass winds** *noun*, *pl.*
ئامێرە زەردەکان ◌ سازهای برنجی
**brasswork** *noun*
کێشانەوە لەسەر زەرد، زەردکاری ◌ براس‌وورک
**brassy** /'brɑ:si, US 'bræsi/ *adjective* (brassier, brassiest)
1 زەردین، لە زەرد 2 بۆر، بەرز و ناخۆش (دەنگ) 3 جلف، بلح، سووک، قرتی، هەرزە 4 بەزریقەوبریقە 5 ڕوودار، بێشەرم، چوختی ◌ 1 برنجی 2 گوش‌خراش 3 جلف 4 پرزرق و برق 5 وقیح، پررو
**brat** /bræt/ *noun*
(نافەرمی) بەچکە، تولە (بە سووک دانانی منال)، (brats) هەتیومەتیو (بنەڕەت: لە *brachet* فەرەنسی کۆن "bitch ،hound") ◌ توله
**brattice** /'bratɪs/ *noun*
تیغەی کانی خەڵووز ◌ تیغه‌ی معدن زغال
**bratwurst** /'bratvɔ:st/ *noun*
جۆرێ سوسیسی ئەڵمانی، لە گۆشتی بەراز ◌ نوعی سوسیس

**bravado** /brəˈvɑːdəʊ, US -doʊ/ *noun*
خۆهەڵکێشی، فرۆفیشاڵ کردن، لافلێدان، خۆ بە ئازا نیشاندان: *an act of sheer bravado*
۞ لافزنی، تظاهر به شجاعت

**brave** /breɪv/ *adjective* (braver, bravest), *noun*
*adj* 1 بەزات، بەجەرگ، چاوسوور، وەند، ئازا، پۆلاخور، شێرکرۆژ، نەبەرد، بوێر، دلێر، مێرخاس، بێباک، مەرد، نەترس، ئازایانە، نەترسانە 2 بەشکۆ، بەرز *n* سووریێستی ئازا، شەرکەری سووریێست ۞ *adj* 1 دلیر، جسور، بی‌پروا، باشهامت، شجاعانه 2 عالی *n* سرخ‌پوست دلاور

**the brave** /breɪv/ *noun*
1 ئازایان، بوێران، نەبەردان 2 سووریێستی ئازا، شەرکەرانی سووریێست، سووریێستی شێرکرۆژ
۞ 1 شجاعان 2 سرخ‌پوست دلاور

**bravely** /breɪvli/ *adverb*
نەترسانە، وەندانە، مەردانە، نەبەردانە، ئازایانە، پیاوانە ۞ شجاعانه

**brave and world** *noun*
دنیای بێ‌گەردی نۆژەن. دنیایەکی نوێی بێ‌گەرد
۞ اتوپیای نوین

**bravery** /ˈbreɪvəri/ *noun*
1 بەزاتی، چاوسووری، ئازایەتی، نەبەردی، نەبەردایەتی، مەردایەتی، شێرکرۆژی، بوێری: 2 *acts of skill and bravery* شکۆ ۞ 1 شجاعت، شهامت، تهور 2 شکوه

**bravo**[1] /ˌbrɑːˈvəʊ, US -ˈvoʊ/ *interjection*
بژی، باریکەڵلا، ماشەڵلا، ئافەرین، زۆرباشە، زارخۆش، دەم‌خۆش (بنەڕەت: لە فەرەنسی، لە ئیتالیایی "bold" (بڕوانە brave) ۞ عالی، آفرین

**bravo**[2] /ˈbrɑːvəʊ/ *noun*
پیاوکوژی بەکرێ‌گیراو یان توندوتیژ ۞ قاتل مزدور یا خشن

**bravura** /brəˈvjʊərə, US -ˈvjʊrə/ *noun, adjective*
*n* 1 (موسیقا) شێواز یان تکنیکی بەرز لە پێرفۆرمانس‌دا 2 مامۆستایی لە لێدان و ژەنین‌دا *adj* بەرز ۞ *n* 1 سبک یا شگرد عالی در اجرا 2 استادی در نوازندگی *adj* عالی

**braw** /brɔː/ *noun*
(هەوا، سکاتلەند) خۆروبان، تاووبان، ساو، روون
۞ آفتابی

**brawl** /brɔːl/ *noun*
شەڕوشوڕ، شەڕەشەق، زرموکوت، لێکسرەواندن، لێکدان، تێکبەربوون، هەراوهوریا، چەق‌ولوور، قاڵەقاڵ، چرەوگورە، هەرا ۞ زدوخورد، قیل و قال، دعوا و مرافعه

**brawler** *noun*
ماسولکە یان بازۆڵەی بەهێز ۞ عضلات قوی

**brawn** /brɔːn/ *noun*
1 ماسوولکە، بازۆڵە، هێزی بازۆڵە، هێز، تەوشک، ستین، قەوەتی لەش، تین، هێز و زۆر 2 خۆراکی گۆشتی بەراز (سەری بەراز یان گوێلک) ۞ 1 ماهیچه، عضله، قدرت عضلانی، زور 2 گوشت قورمه

**brawny** /ˈbrɔːni/ *adjective*
بازۆڵەبەهێز، بەتین، بەبرشت، بەتابشت، بەشیان، بەستین، بەهێز، نیرگ، بەقەوەت ۞ دارای ماهیچه‌های قوی، پرقدرت، قوی

**braxy** /ˈbraksi/ *noun*
جۆرێ ئازاری بەکتریایی کوشندەی fatal bacterial شەک (مەڕ) ۞ براکسی

**bray** /breɪ/ *noun*
زەڕە، زەڕەزەڕ: *a voice somewhere between a bray and a bellow* ۞ عرعر

**Braz** *abbreviation* Brazilian

**braze** /breɪz/ *noun*
پێکالکانی بە زەردەجۆش یان لەحیمی (بنەڕەت: لە *braser* فەرەنسی "solder") ۞ اتصال لحیمی

**brazen** /ˈbreɪzn/ *adjective*
1 زەردکرد، (دروستکراو لە) زەرد، زەردە، کالانی، زەردین، زرنگانەوەی زەرد 2 ناخۆش، گڕ (دەنگ) 3 چوختی، بێ‌شەرم، چەقاوەسوو، رووداڕ، چوختی ۞ 1 برنجی، ساخته‌شده از برنج، صدای برنج 2 گوشخراش 3 وقیح

**brazen-faced** *adjective*
بێ‌حەیا، بێ‌شەرم، چەقاوەسوو ۞ بی‌حیا

**brazenly** /ˈbreɪznli/ *adverb*
چوختی‌یانە، بێ‌شەرمانە ۞ وقیحانه

**brazier**[1] /ˈbreɪziə(r)/ *noun*
1 مەنقەڵ، ئاگردان، خەڵووزدان، رەژی‌دان 2 کەباب ۞ 1 منقل 2 کباب

**brazier**[2] /ˈbreɪziə(r)/ *noun*
زەردکار، زەردگەر ۞ برنج‌کار

**brazil** /brəˈzɪl/ *noun*
1 (Brazil nut) گوێزی برێزیل، هی درەختێکی دارستانی ئەمریکای باشووری (*Bertholletia excelsa*) 2 (Brazil wood) سەختەداری سووری درەختێکی گەرمێنان (توخم *Caesalpinia*) و رەنگیشی لێ‌دەگیرێ ۞ برازیل

**Brazilian** /brəˈzɪliən/ *adjective, noun*
*adj* سەربە یان پێوەندی بە برێزیلەوە هەیە، برێزیلی، برازیلی *n* خەڵکی برێزیل، برێزیلی، دانیشتووی برێزیل ۞ *adj* برزیلی *n* اهل برزیل

**breach** /briːtʃ/ *noun*
1 شکاندن، لەبەرچاونەگرتن، بنپێ‌کردن، پێشێل(کردن)، تەپساندن، پێشێلکاری: *a breach of contract/copyright/warranty* 2 نەمان، شێوان، تۆران، داگۆران، دابڕان (پێوەندی) 3 جیاوازی، کەلێن، رەخنە، کەلەبەر، دزە، شەبەق، دەلاقە، کون، درز، قەڵەش، تلیش،

چاکلێتی (بە کاکلەوە) ◊ 1 برونی 2 عضو در پیشاهنگی 3 کیک شکلاتی

**brownie points** *noun, pl.*
هاندان، ئافەرین پێوتن ◊ تشویق

**Browning** *noun*
1 شەستیرێکی خۆکاری بەناوفێنکەوەبوو 2 جۆرێ پێستۆڵی خۆکار (بنەڕەت: لە ناوی داڕێژەری ئەمریکایی John M. *Browning*) ◊ براونینگ

**brownish** /'braʊnɪʃ/ *adjective*
بۆرەلووک، قاوەیی‌باو، خورمایی‌باو، کەمێ قاوەیی، ئامال‌قاوەیی، سەوزە، رەشتالە ◊ نسبتاً قهوەای

**brown lung** = byssinosis

**brownout** *noun*
(زۆرتر لە ئەمریکای باکووری) کەمێ تاریک‌کردن، نیوەتاریکاندن، تاریکاندنی نیوەچڵی؛ ماوەیێ کە لەودا هێزی کارەبایی کەم دەبێتەوە، ب.ت. هاتنەخوارەوە یان کەم‌بوونەوەی فۆڵتاژ تا بەرلە تاریکی blackout بگرێ ◊ تیرەسازی جزئی؛ برونوت

**brown owl** = tawny owl

**brown paper** *noun*
کاغزی پێچانەوە ◊ کاغذ بستەبندی

**brown rat** = norway rat

**brown recluse spider** *noun*
جالجالووکە لاتەریکە قاوەیی: جۆرێ جالجالووکەی قاوەیی کاڵ و یەکجار ژاراوی ئەمریکای باکووری، نیشانەیێکی ڤیۆلینی ئاسای رەشی لەسەر ناوچەی سەری هەیە [*Loxosceles reclusa*] ◊ نوعی عنکبوت

**brown rice** *noun*
برنجی قاوەیی، برنجی کەپەک‌دار ◊ برنج قهوەای

**brown rot** *noun*
1 جۆرێ نەخۆشی کەڕوویی (دەبێتە هۆی رەنگ‌گۆڕان و ژاکانی سێو، هەرمێ و میوەکانی تر) 2 جۆرێ نەخۆشی کەڕوویی دەبێتە هۆی نەرمی و قەڵەشینی تەختە ◊ براون روت

**Brownshirt** *noun*
کراس‌قاوەیی (= ئەندامی نیمچەلەشکری نازی، لە 1921دا لە لایەن هیتلێرەوە دامەزرا و 1934 سەرکوت کرا) ◊ براون‌شیرت

**brownstone** /'braʊnstəʊn, US -stoʊn/ *noun*
1 بەردی قاوەیی یان سەوزە، ورکەبەردی قاوەیی 2 خانووبەرەی بەرووکار بەردی قاوەیی ◊ 1 ماسەسنگ قهوەای 2 برونستون

**brown sugar** *noun*
شەکری قاوەیی یان سوور (کەمێکی وەژێردرابێ) ◊ شکر سرخ

**brown study** *noun*
چوونەماڵ یان نوقمی خەم و بیرەوە، تێرامان ◊ تأمل عمیق

**Brown Swiss** *noun*
جۆرێ مانگای بەشیر و بەتاقەتی زلە و قاوەیی سویسی ◊ نوعی گاو

**brown tree snake** *noun*
مارەقاوەیی دارژی: جۆرێ ماری colubrid زۆر زلەی دارژی ژاراوی باکووری ئەوسترالیا، گینەی نوێ New Guinea دوورگەکانی سولۆمۆن Solomon Island [*Boiga irregularis*] ◊ نوعی مار

**brown trout** *noun, pl.* same
کەشینەی قاوەیی، ماسی‌یەخاتوونەی قاوەیی: کەشینەی ئاسایی رووبار و گۆمەکانی ئەورووپا [*Salmo trutta*] ◊ قزل‌آلای قهوەای

**browny** /'braʊni/ = brownish

**browse** /braʊz/ *noun*
1 لەوەڕین، چەرین 2 چڕبی، هەژگ، گەلاوێژ 3 پەرهەڵدانەوە، هەڵدانەوە، گەڕان (گەڕان بە دوای زانیاری‌یەکدا لەسەر کامپیوتێر) 4 گەڕان ◊ 1 چرا 2 شاخ‌وبرگ 3 عمل ورق‌زدن، تورق 4 گشت

**browser** /'braʊzə(r)/ *noun*
(کامپیوتێر) هەڵدەرەوە ◊ بروسر

**brucellosis** /ˌbru:sə'ləʊsɪs, US -loʊs-/ *noun, pl.* brucelloses
تەبی مالت (بەهۆی brucella تووش دەبێ) ◊ بروسیلوز، تب مالت

**brucite** /'bru:sʌɪt/ *noun*
جۆرێ کانی سپی، بۆر یان سەوزباو، لە هایدرۆکسایدی مەنیزیۆمی لەگەڵ ئاو تێکەڵ‌کراو پێکهاتووە (بنەڕەت: لە ناوی کانی‌ناسی ئەمریکایی Archibald *Bruce*) ◊ بروسیت

**bruin** *noun*
ورچ، حرش، هرچ ◊ خرس

**bruise** /bru:z/ *noun*
1 شین‌بوونەوە، کەووبوون، رەش‌بوونەوە، خوێن‌تێزان: *to be* ◊ *cuts and bruises* 2 لکە، لەکە، شینکە (سەر میوە یان شانەیێکی رووەک plant tissue) ◊ 1 کبودی 2 لک

**bruised** /bru:zd/ *adjective*
شینەوەبوو، رەشەوەبوو، کەوو، کەوو بۆتەوە: *a bruised ego* ◊ *bruised fruit* ◊ کبود

**bruiser** /'bru:zə(r)/ *noun*
پیاوی شەڕانی، کەڵەگا، پیاوی بێ‌ڕەوشت یان بێ‌ماریفەت، کەرەپیاو ◊ گردن‌کلفت، مرد بی‌نزاکت

**bruising** /'bru:zɪŋ/ *noun, adjective*
*n* شینەوەبوویی، رەش‌بوونەوە، خوێن‌تێزان،

جێگای لێدان: *adj internal bruising* ناخۆش، تـــال، taxing، arduous ۞ *n* کبــــــــــودی، خونمردگی *adj* تلخ

**bruit** /bru:t/ *noun*

1 راپۆر، دەنگۆ، بەندوباو، قسەلۆک 2 (پزشکی) دەنگێکــی ئاناســایی کــە لــە stethoscope دەبیسرێ ۞ 1 گزارش، شایعه 2 برونیت

**brumal** *adjective*

زســتانی، زمـــانی، زڤــستانی، ئامــاژە یــان لــە زستاندا رووددا ۞ زمستانی

**brumby** /'brʌmbi/ *noun, pl.* brumbies

(لە ئەوسترالیا) ئەسپی سڵ ۞ اسب چموش

**brume** /bru:m/ *noun*

1 (ویژەیـــی) مـــژ، تـــەم، دومـــان، mist، fog 2 زستان، زمسان، زمـستان، زڤـستان (بنـەڕەت: لە فەرەنـسیـیەوە، لە *bruma* لاتین "زسـتان") ۞ 1 مه 2 زمستان

**brumous** /'bru:məs/ *adjective*

مژاوی، تەماوی، مژداگرتوو ۞ مه‌گرفته

**brummagem** /'brʌmədʒ(ə)m/ *adjective, noun*

*adj* 1 بـێنـرخ، هیچەکـە، بـێبایـەخ، سـووک، هەرزان 2 گزی، ساختە، بـەفروفێڵ، درۆ *n* شـتی ساختە یـان قەڵـب ۞ *adj* 1 بـیارزش، ارزان 2 جعلی، تقلبی *n* چیز تقلبی

**Brummie** /'brʌmi/ *noun, adjective,* also Brummy

*n* برامی (کەسێ لە شاری بیرمینگهامی بریتانیا)، *adj* سەربە بیرمینگهام، بیرمینگهامی بیرمینگهامی ۞ برامی

**brunch** /brʌntʃ/ *noun*

قاوەڵتوون، بەرقەندە ۞ ناهار صبحانه

**brunet** /brʌnt/ *adjective. fem.* brunette

1 سەوزە، رەشتاڵە 2 پیاوی رەشتاڵـە ۞ 1 سبزه 2 مرد سبزه

**brunette** /bru:'net/ *adjective*

ژنی سەوزە یان رەشتاڵە ۞ زن سبزه

**Brunhild** *noun,* also Brünnhilde or Brunhilde, German

برۆنهیلـت، برۆنهیلـد: شـاژنێ لـە ئـەفـسانەی ئەڵمانیدا کە لە لایەن زیگفریدەوە Siegfried بۆ گانتێر Gunther رفێنرا ۞ برونهیلت، برونهیلد

**Brunizem** *noun*

گلی قاوەیی چیمەنلان ۞ برونیزم

**Brunswick stew** *noun*

جـۆرێ چێـشت یـان شـۆرباوی سـەوزەوات و دووجۆر گۆشت (وەک مریـشک و سمۆرە) ۞ نوعی غذا

**brunt** /brʌnt/ *noun*

گوشـار، گـڤاشتن، بـار، قورسـایی، گرانـایی، سەنگی، گورز ۞ فشار، ضربه

**bruschetta** /brʊ'sketə/ *noun*

نـانی بـرژاوی ئیتالیـایی و خووسـێنراو لـە رۆنی زەیتووندا ۞ بروسکتا

**brush**[1] /brʌʃ/ *noun*

1 فلچە، برۆس، پـەرەمووچ 2 کلکی رێـوی 3 دەوەن، دارۆکـە، بێـشە، درەو، سـێرت، درک، جارەدەوەن، وشکەڵ، لقوپۆپی براو یان شـکاو، ورکـەدار، لقـی شـکاو یـا بـراو 4 شەڕوشـۆڕ، تێکهەڵـچوون، لێکـدان 5 سـڕین، فـلچەکاری، فلچەلێدان 6 (ئەوسترالیا) کچ یان ژنی لەبار ۞ 1 بُرس، فرچه، قلم‌مو 2 دم روباه 3 بوته، بیشه، بته، خار، بوته‌زار 4 درگیری 5 عمل تمیز کردن 6 زن یا دختر لوند

**brush**[2] /brʌʃ/ *noun*

پنجـک، بنجـک، بزار، بنتا، خەلـف: *a burush fire* ۞ پاجوش

**brushed** *adjective*

شانەکراو، برۆس‌کراو ۞ برس‌زده

**brush-off** *noun,* give somebody the brush-off

نەویـستن، بەرپـەرچدانـەوە، گـوێپێنـەدان، سـووکایەتی، بەهێندنـەگرتن، بـەهیچدانـان، باس‌نەکردن ۞ بی‌اعتنایی، توهین

**brushtail** *noun*

کلکفلچە(یی): marsupial یکـی شـەوگـەڕی پتـر دارنـشینی ئـەوسـترالیایی [*Trichosurus vulpecula* و جـۆرە پێـوەنـدیدارەکـان] ۞ براش‌تایل

**brush-turkey** *noun*

جۆرێ باڵندەی زلەی شێوەبۆقلە، هی نـوگینی [خێزان Megapodiidae: چەندین جـۆرن] ۞ نوعی پرنده

**brush-up** *noun*

1 رێکوپێککردنی دەموچاو یـان رواڵـەت، دەس‌پیاگێـڕان 2 پیاهاتنـەوە، دەورکردنـەوە، پیاچوونەوە ۞ 1 مرتب کردن ظاهر 2 مرور

**brush wolf** = coyote

**brushwood** /'brʌʃwʊd/ *noun*

وشکەڵ، ورکەدار، لقوپۆپی براو یان شـکاو ۞ شاخه‌ی شکسته یا بریده

**brushwork** /'brʌʃwɜ:k, US -wɜ:rk/ *noun*

پەرەمووچکاری، شێوەی تایبەتی بەکارهێنانی فلچە یان پـەرەمووچ ۞ روش مخصوص کـاربرد قلم مو

**brusque** /bru:sk, brʊsk, US brʌsk/ *adjective*

1 بێڕەوشت، بێڕەوشتانە، بێماریفەت 2 بەپەلە، بێتاقـەت، بەهەشـتاو 3 تونـد، تونـد و کـتوپڕ (قسەکردن) ۞ 1 بی‌ادب 2 عجول 3 خشن

**brusquely** /bru:skli, brʊskli, US brʌskli/ *adverb*

به پەلە: *'What's your name?' he asked* ۞ با عجله *brusquely*

**brusqueness** /bruːsknəs, brʊsknəs, US brʌsknəs/ *noun*
پەلە، توندی ۞ عجله، شدت

**brussels sprout** /ˌbrʌslz ˈspraʊt/ *noun*, also Brussel sprout
کەلەمە دوگمە، کەلەمفندقی، کەلەمی راسیلی، کەلەمی بروکسیلی، خێزانی mustard [*Brassica oleracea gemmifera*] ۞ کلم فندقی

**brutal** /ˈbruːtl/ *adjective*
1 درندە، هۆڤ، بێبەزەیی، نەپارێز، دلڕەق، گیانەوەرخوو، دلڕەش، توندوتیژ، زۆردار، زاڵم، بەزەبروزەنگ: *a brutal and repressive regime* ◊ *a -al attack/murder/ripe/killing* 2 دڕندانە، بێبەزەییانە 3 ناخۆش، تاڵ: *the brutal truth* ◊ *a brutal mistake* ۞ 1 وحشی، سبع، حیوانی 2 وحشیانە، بیرحمانە 3 طاقتفرسا، ناخوشایند

**brutalism** /ˈbruːtəlɪzəm/ *noun*
دڕندایەتی، دڕندەیی، هۆڤیگەری، نەپارێزی، دلڕەقی، توندوتیژی، ستەم، زوڵم، زۆرداری، زەبروزەنگ، بێبەزەییەتی ۞ قساوت، سبعیت، ظلم، خشونت، بیرحمی، ددمنشی

**brutalist** /ˈbruːtəlɪst/ *noun, adjective*
*n* کەسێکی دڕندە یان هۆڤ، مرۆی توندوتیژ *adj* زۆردارانە، بێبەزەییانە ۞ *n* آدم سبع یا خشن *adj* با بیرحمی

**brutality** /bruːˈtæləti/ *noun, pl.* brutalities
دڕندایەتی، دڕندەیی، هۆڤیگەری، نەپارێزی، دلڕەقی، توندوتیژی، ستەم، زوڵم، زۆرداری، زەبروزەنگ، گیانەوەرخوویی، دڕندەڕەفتاری: *the brutalities of war* ۞ قساوت، سبعیت، ظلم، خشونت، بیرحمی، ددمنشی

**brutalization** *noun*
دڕندایەتی، دڕندەخوویی، گیانەوەرخوویی، کردنەدڕندە ۞ جانورخویی، ددمنشی، حیوان صفت نمودن

**brutally** /-təli/ *adverb*
بێبەزەییانە، دڕندانە: *He was brutally assaulted* ۞ بیرحمانە

**brute** /bruːt/ *adjective, noun*
*adj* 1 دڕندە، گیانەوەرخوو، گیانەوەری، بێبەزەیی، نامرۆڤانە، هۆڤ: *the ways of the brute world* 2 جەستەیی، لەشی 3 تینەگەیشتوو 4 شەهوانی 5 بنچینەیی، سادە و ناخۆش *n* 1 گیانەوەر، گیانلەبەر (زلە و دڕ)، مرۆڤ یان گیانەوەری دڕندە، دڕندە، کێوی 2 گیانەوەری بێزمان ۞ *adj* 1 وحشی، حیوانی، بیرحم 2 جسمانی، بدنی 3 فاقد شعور 4 شهوانی 5 بنیادی، سادە و ناخوشایند *n* 1 حیوان 2 حیوان زبانبستە

**brutish** /ˈbruːtɪʃ/ *adjective*
1 گیانەوەرئاسا، دڕندە، توندوتیژ: *lived a short and brutish life as a slave* 2 تینەگەیشتوو، نەفام، گەوج ۞ 1 حیوانوار، خشن 2 فاقد شعور

**brutishly** /ˈbruːtɪʃli/ *adverb*
توندوتیژانە، بە توندوتیژی ۞ بە طور خشن

**brutishness** /ˈbruːtɪʃnəs/ *noun*
توندوتیژی، دڕی، دڕندەیی، گیانەوەرئاسایی ۞ خشونت، حیوانواری

**bruxism** /ˈbrʌksɪz(ə)m/ *noun*
(پزشکی) ددانەچیڕ، ددانەکیرە (لە خەوا) ۞ بروکسیسم

**Brylcreem** /ˈbrɪlkriːm/ *noun*
(دروشمی بازرگانی) کریمی موو یان سەر (هی پیاوان) ۞ کرم مو

**Brynhild** *noun*, Old Norse *Brynhildr*
برینهیلد: Valkyrieێ کە لە لایەن زیگفریدەوە لە خەوی جادوویی یان تەلەسمکراوەوە هەڵدەستێ ۞ برینهیلد

**bryological** *adjective*
سەربە قەوزەناسی، کەژاوناسییانە ۞ خزەشناختی

**bryologist** *noun*
قەوزەناس، کەژاوناس ۞ خزەشناس

**bryology** /brʌɪˈɒlədʒi/ *noun*
قەوزەناسی، کەژاوناسی ۞ خزەشناسی

**bryony** /ˈbrʌɪəni/ *noun, pl.* bryonies
جۆرێ گیای بەرسووری هەڵچوو [*Bryonia dioica* (هی سپی) و *Tamus communis* (هی رەش)] ۞ نوعی گیاه

**Bryophyta** /ˌbrʌɪə(ʊ)ˈfʌɪtə/ *noun, pl.*
قەوزەگیاکان (moss و liverwort دادەگرێ) ۞ بریوفیتا

**bryophyte** *noun*
گیای قەوزەیی، قەوزەگیا(یی) ۞ بریوفیت

**Bryozoa** /ˌbrʌɪəˈzəʊə/ *noun, pl.*
قەوزەئاژەڵەکان، قەوزاژەڵەکان، گیانەوەرانی قەوزەیی ۞ بریوزوآ

**bryozoan** *adjective, noun*
قەوزەئاژەڵ، قەوزاژەڵ، گیانەوەری قەوزەیی ۞ بریوزوآن

**Brythonic** /brɪˈθɒnɪk/ *noun, adjective*, also Brittonic
*n* کۆمەڵی باشووری زمانە سێلتییەکان، کە بریتین لە: Welsh، Cornish و Breton *adj* سەربەو زمانانە ۞ بریتونیک

**BS** /ˌbiː ˈes/ *abbreviation* British Standard
ئەنیستیتوی ستاندارد یان پێوانەی بریتانیا ۞ مؤسسەی استاندارد بریتانیا

**B.S.** /ˌbiː ˈes/ *abbreviation* Bachelor of Science

**B.Sc.** /ˌbi: es 'si:/ *abbreviation* Bachelor of Science

**BSE** /ˌbi: es 'i:/ *abbreviation* bovine spongiform encephalopathy (mad cow disease)
نەخۆشی هاری یان شێتی گایی (نەخۆشی‌یەکی مێشکی ولاخە کە دەداتە nervous system و پێی دەمرێ) ◌ بیماری جنون گاوی

**BSI** /ˌbi: es 'aɪ/ *abbreviation* British Standard Inistitute
ئەنیستیتۆی ستاندارد یان پێوانەی بریتانیا ◌ مؤسسەی استاندارد بریتانیا

**B-side** *noun*
(موسیقا) بەری دووەم، پشتەوە ◌ روی دوم

**BST** /ˌbi: es 'ti:/ *abbreviation* British Summer Time

**Bt.** *abbreviation* Baronet

**BTEC** *abbreviation* Business and Technician Education Councel

**Bthu** *abbreviation* British thermal unit

**Btu** = Bthu

**bubble** /'bʌbl/ *noun*
1 بلق، تۆقلە، پۆرگاو، قولپ، پەقزک، هەک، بلقەبلق، کولەکوڵ، قولتەقول: - *champagne* 2 خەیاڵی پڕوپووچ *a -ble of oxygen* ◊ *bles* ◌ 1 حباب، قل‌قل، غلغل 2 اندیشەی واهی

**bubble and squeak** *noun*
چێشت یا خۆراکی کەلەم و پەتاتە ◌ غذای کلم و سیب‌زمینی

**bubble bath** *noun*
گەرماو یان حەمامی تۆقلە ◌ حمام حباب

**bubble chamber** *noun*
(فیزیک) ژووری تۆقلە ◌ اتاقک حباب

**bubblegum** /'bʌblgʌm/ *noun*
بنێشتی تۆقلەدار یان تۆقلەهەڵدەر ◌ آدامس بادکنکی

**bubblehead** *adjective*
(نافەرمی) کەسێکی گەوج ◌ آدم احمق

**bubblejet printer** *noun*
جۆرێ چاپ‌گەری جەوهەری ◌ نوعی چاپ‌گر

**bubbly** /'bʌbli/ *adjective* (bubblier, bubbliest), *noun*, also champagne
*adj* 1 تۆقلاوی، پڕتۆقلە، بلقەبلق، هەڵقوڵیو: *effervescent* 2 پڕجموجۆڵ، هەڵسوور، لەجۆش، بەگوڕ 3 تۆقلەیی *n* (نافەرمی) شامپاین ◌ *adj* 1 پرحباب 2 پرتحرک، پرجوش و خروش 3 حباب‌مانند *n* شامپاین

**bubinga** /bju:'bɪŋgə/ *noun*
جۆرێ داری قاوەیی سوورباوی گەرمێنانی ئەفریکا ◌ نوعی چوب

**bubo** /'bju:bəʊ, US -boʊ/ *noun, pl.* buboes
(پزشکی) سندان، خەیارە، خەیارۆک، بیووبۆ ◌ خیارک

**bubonic** /bju:'bɒnɪk/ *adjective*
(پزشکی) سەربە سندان، سەربە خەیارە، پێوەندی بە سندانەوە هەیە ◌ وابستە خیارک

**bubonic plague** /bju:ˌbɒnɪk 'pleɪg, US -ˌbɑ:nɪk/ *noun*
پەتا یان تاعوونی خەیارە ◌ طاعون خیارکی

**buccal** /'bʌk(ə)l/ *adjective*
دەمی، زاری، گوپی، کولمەیی، ڕوومەتی، سەربە ڕوومەت یان دەم: *the buccal cavity* ◌ وابستە بە دهان یا گونە (buccally *adv*)

**buccaneer** /bʌkə'nɪə(r), US -'nɪr/ *noun*
1 (مێژوویی) مەترسی‌کار، ریسک‌کار 2 دەریاگر، دز یان چەتەی دەریایی (ب.ت. لە کارائیب) ◌ 1 مخاطرەجو 2 دزد دریایی

**buccaneering** /ˌbʌkə'nɪərɪŋ, US -'nɪrɪŋ/ *adjective*
مەترسی‌کار، نەترس، ئازا، بێ‌باک، بێ‌ئەندێش ◌ مخاطرەجو، بی‌پروا

**buccinal** /ˌbʌkə'nɪ(r)/ *adjective*
شەیپووری ◌ وابستە بە بوکسیناتور، شیپوری

**buccinator** /'bʌksɪneɪtə/ *noun*
(توێکاری) ماسوولکەی شەیپووری، ماسوولکەی تەخت و تەنکی thin broad muscle دیوارەی چەناگە ◌ بوکسیناتور

**bucentaur** *noun*
گامرۆ، گامێر (بوونەوەرێکی ئەفسانەیی نیوەگا و نیوەمرۆڤ) ◌ بوسنتور

**bucranium** *noun*
(بیناسازی) کەللەگایی، کەللەگاوی ◌ کلەگاوی

**buchu** /'bʌku:/ *noun*
1 جۆرێ دەوەنی heather ئاسای ئەفریکای باشووری، لەبەر عەتری ڕۆن یان وەک گیای جوانی دەکرێ [*Agathosma betulina* و جۆرەکانی تر] 2 دەرمانی ڕەوانی میز لە گەڵای ئەو دەوەنە ◌ باکو

**buck**[1] /bʌk/ *noun*
1 گاکێوی، (نێرە)گاکێوی، کەڵ، نێراسک، ئافوور، ئافۆر 2 کەروێشکی نێر 3 ئاسک 4 لێپرسراوێتی، بەرپرسایەتی 5 شەقە، چێوشەق، ئەسپەدارین ◌ 1 گوزن نر 2 خرگوش نر 3 آهو 4 مسؤلیت 5 خرک

**buck**[2] /bʌk/ *noun*
1 (لە ئەمریکا، ئەوسترالیا، نیوزیلەند و هتد) دۆلار 2 (لە هیند) ڕووپیە 3 (لە ئەفریکای باشووری) ڕاند ◌ 1 دلار 2 روپیە 3 راند

**buckaroo** /ˌbʌkə'ru:/ = cowboy

**buckboard** *noun*
جۆرێ کالیسکەی چوارپێچکە (یان

چوارچەرخە)ی ئەسپ‌کێش ◌ نوعی کالسکە

**bucked** *adjectived*
بەکەیف، خۆشحاڵ، بەنەشە، دڵخۆش، شاد ◌ شاد و خرم

**bucket** /'bʌkɪt/ *noun*
1 سەتڵ، مەڕدۆش، مانگادۆش، دۆڵ، دۆلکە، دۆلکە، دۆلچە، ئاڤدانک، پەقرەچ 2 (buckets، نافەرمی) بڕێکی یەکجار زۆری ئاو ◌ 1 سطل 2 (در جمع) مقدار زیاد آب

**bucketful** /-fʊl/ *noun, pl.* bucketfuls
پڕمانگادۆشێ، سەتڵێ، دۆلکەیێ، پڕ سەتڵێ ◌ بە اندازەی یک سطل

**bucket seat** *noun*
کورسیی تاکەکەسی (ب.ت. لە ماشێن‌دا) ◌ صندلی یک نفرە

**bucket shop** *noun*
شوێن یان ئاژانسی فرۆشتنی بلیتە هەرزانەکانی فڕۆکە ◌ بوکت شاپ

**buckeye** *noun*
1 دار یان دەوەنێکی ئەمریکایی سەربە horse chestnut [تۆخم *Aesculus*: چەندین جۆرن] 2 جۆرێ پەپوولەی دنیای تازە بە ڕەنگی قاوەیی یا پرتەقاڵی [*Junonia coenia*] 3 (Buckeye) ڕەسەنی هەرێم یان ئەیالەتی Ohio ◌ بوکی

**buck fever** *noun*
هەرا و قرپوی ڕاوچی تازەکار بۆ دیتنی یەکەم نێچیر ◌ بوک فور

**buckhorn** *noun*
شاخی گاکێوی، بۆ دەسکی چەقۆ یان سێرەی چەک ◌ بوکهورن

**buckhound** *noun*
تاجی، تاژی، سەگی ڕاوی ◌ تازی، سگ شکاری

**Buckingham Palace** /ˌbʌkɪŋəm 'pæləs/ *noun*
1 ماڵی فەرمی خێزانی پاتشایی بریتانیا لە لەندەن 2 خێزانی پاتشایی بریتانیا ◌ بوکینگهام پالاس

**buckle** /'bʌkl/ *noun*
1 ئاوزوونە، ئاغزۆنە، ئاوزوونگە، ئاوزینە، پزیم، سێر، بەرەزمانە، بەلەزوانە، قولاپ 2 لاری، خواری، بادران، پێچ‌خواردن، چەمانەوە، داهاتنەوە، گەڕان (buckled *adj*: بەئاغزۆنە، ئاغزۆنەدار، پزیم‌دار، ئاوزوونگەدار، ئاوزینەدار، ئاوزوونەڕێز) ◌ 1 سگک، قلاب 2 خمش، کجی، تاب

**buckler** /'bʌklə(r)/ *noun*
(مێژوویی) قەڵغان، مەتاڵ، سپەر (بنەڕەت: لە *(escu) bocler* فەرەنسی کۆن، واتا "(قەڵغان) (shield) with a لەگەڵ سنگ یان گۆپکە boss") ◌ سپر

**buckler fern** *noun*
فێرنەقەڵغانە [*Dryopteris dilatata* و جۆرەکانی تر] ◌ نوعی سرخس

**buckminsterfullerene** /ˌbʌkmɪnstə'fʊləriːn/ *noun*
(کیمیا) شێوەی فولێرین کە شەست گەردیلەی کاربۆنی هەیە (بڕوانە fullerene، لە ناوی داڕێژەر و ئارکیتێکتی ئەمریکایی Richard *Buckminster Fuller*) ◌ بوکمینسترفولرین

**buck naked** *adjective*
(نافەرمی، ئەمریکا) ڕووت و قووت ◌ لخت

**buckpasser** *noun*
کەسێ لەبەر بەرپرسایەتی دەردەچێ، لەمل‌خۆنەخستوو ◌ مسؤلیت‌گریز

**buckpassing** *noun*
لەسەرخۆکردنەوە، لەمل‌خۆنەخستن، لەمل‌خۆدامالین، لەبەردەرچوون، بەئەستۆوەنەگرتن ◌ مسؤلیت‌گریزی

**buckra** /'bʌkrə/ *noun, pl.* same or buckras
(سوورپێستەکان، سووکانە) پیاوی سپی‌پێست ◌ مرد سفیدپوست

**buckram** /'bʌkrəm/ *noun*
پارچەی جزوبەند، پارچەی تێگرتن (کتێب) ◌ پارچەی صحافی

**Buck's Fizz** *noun*, also mimosa
(بریتانیا) شامپاین یان مەی هەلچووی سپی، لەگەڵ ئاوی پرتەقاڵ وەک کوکتایلێ تێکەڵ دەکرێ ◌ بوکز فیز

**buckshee** /bʌk'ʃiː, US 'bʌkʃiː/ *adjective, adverb*
(نافەرمی، بریتانیا) بەلاش، خۆڕایی، بێ‌پارە؛ gratuity ،windfall ◌ مجانی

**buckshot** /'bʌkʃɒt, US -ʃɑːt/ *noun*
ساچمەی گاکێوی، ساچمەزلە ◌ چارپارە

**buckskin** /'bʌkskɪn/ *noun, adjective*
*n* 1 تیماج، تیماج، چەرمی ئاسک، کەوڵی ئاسک و بزن 2 (buckskins) پێلاو و بەرگی لە تیماج *adj* تیماجی ◌ *n* 1 تیماج 2 (در جمع) کفش و لباس تیماجی *adj* تیماجی

**buckthorn** *noun*
دەوەنێکی دڕکاوی کە بەرێکی ڕەش دەگرێ و هێندێ لەوان لە بواری پزشکیدا بەکاردێنرێ، سنجووەتاڵە؟ [*Rhamnus cathartica* و جۆرەکانی تر] ◌ بوک‌تورن، خولان

**bucktooth** *noun*
ددان‌کەرویشکی، ددان‌هاتووەپێش، ددان‌دەرپەڕیو، ددان‌لەپێش، ددان‌پێش‌هاتوو ◌ دندان خرگوشی

**bucktoothed** *adjective*
ددان‌کەرویشکی، ددان‌هاتووەپێش ◌ دارای دندان‌های خرگوشی

**buckwheat** /'bʌkwiːt/ *noun*
گەنمەڕەشە [*Fagopyrum esculentum*] ◌ گندم گاوی

**buckwheat flour** *noun*

ئاردی گەنمەرەشە ◌ آرد گندم گاوی

**bucolic** /bjuːˈkɒlɪk, US -ˈkɑːlɪk/ *adjective, noun,* also pastoral

*adj* 1 لادێیی، دێهاتی، دێیی 2 سەربە ژیانی لادێیی 3 شوانی *n* 1 هەڵبەستی شوانی، شوان 2 جووتیار، وەرزێر 4 شوان ◌ *adj* 1 روستایی 2 وابسته به زندگی روستایی 3 چوپانی *n* 1 شعر شبانی 2 دهقان 3 چوپان

**bucolically** /bjuːˈkɒlɪkli, US -ˈkɑːlɪkli/ *adverb*

لادێیانە، دێهاتی‌یانە ◌ روستایی‌وار

**bucolics** *noun, pl.*

هەڵبەست لەباری ژیانی لادێیی‌یەوە ◌ شعر دربارەی زندگی روستایی

**bud**[1] /bʌd/ *noun*

1 چرۆ، گۆپکە، گوپیتە، تووز، خونچە، غونچە، چم، سۆلینە، شکوفە، فنچقە: *the first buds appearing in spring* 2 (زیندەناسی) زیادی یا وەچێ outgrowth لە زیندەوەرێ organism کە جیا دەبێتەوە تا ئەندامێکی نارەگەزی یان زاوێی asexually جیا و نوێ پێکبێنێ 3 (گیانەوەرناسی) لاقێکی سەرەتایی rudimentary یان appendage تری گیانەوەرێ کە هێشتا تەواو هەڵی نەداوە ◌ 1 غنچه، جوانه 2 و 3 بود

**bud**[2] *interjection*

کاکە! برا! (لە هەراڵی‌کردندا) ◌ داداش

**bud**[3] = buddy

**Buddha** /ˈbʊdə/ *noun*

بودا، پەیکەر یان ئەدگار (وێنە)ی بودا (563؟–483؟ پێش‌زایین) ◌ بودا، تندیس یا شمایل بودا

**Buddhism** /ˈbʊdɪzəm/ *noun*

بودایزم، بوداباوەری (= دین یان فەلسەفەیێکی بەربڵاوی ئاسیایی لەسەر بنچینەی فیلسووفی هیندی باکووری Gautama Siddartha یا Buddha رۆنراوە) ◌ آیین بودایی

**Buddhist** /ˈbʊdɪst/ *noun, adjective*

*n* بودایی، بوداباوەر *adj* بودائیستی ◌ *n* بودایی *adj* بودایيستی

**Buddhistic** *adjective*

بودائیستی ◌ بودایيستی

**budding** /ˈbʌdɪŋ/ *adjective*

ساوا، کۆرپە، تازەکوورە، تازەپشکوتوو ◌ نوپا

**buddle** /ˈbʌdl/ *noun*

تەشت(ی پەل، بۆ تیاشواردنی کانی خاو) ◌ لاوک

**buddleia** /ˈbʌdlɪə/ *noun*

جۆرێ دەوەنی گوڵ سپی یان زەرد [ *Buddleia davidii* (butterfly bush) و جۆرەکانی تر] ◌ نوعی بوته

**buddy** /ˈbʌdi/ *noun, pl.* buddies

1 کاکە (بۆ هەراڵی‌کردن لە کەسێ) 2 دۆست، هاورێ، هەڤاڵ، companion ◌ 1 داداش 2 رفیق

**budgerigar** /ˈbʌdʒərigɑː(r)/ *noun*

تووتی ئەوسترالیایی، جۆرێ parakeet ئەوسترالیایی چکۆلەی مێگەلژی gregarious [*Melopsittacus undulatus*] ◌ مرغ عشق

**budget** /ˈbʌdʒɪt/ *noun, adjective*

*n* 1 دراونامە، بودجە، حیسابی داهات و خەرج، تێچوون: *a monthly/an annual/a family budget* ◊ *an advertising budget of $2 million* ◊ *a big-budget movie* ◊ *budget cuts* 2 جانتا یان کیفی چەرمی، هەروەها ئەو شتانەی کەوا تیایەتی *adj* هەرزان، *n* 1 ◌ *a budget flight/hotel* :inexpensive بودجه، هزینه 2 کیسەی چرمی *adj* ارزان

**budget account** *noun*

حساب یا هەژماری دراونامە ◌ حساب بودجه‌ای

**budgetary** /ˈbʌdʒɪtəri, US -teri/ *adjective*

دراونامەیی، سەربە یان پێوەندی بە بودجەوە هەیە، بودجەیی: *budgetary policies/reform* ◊ *-etary control* ◌ بودجه‌ای، وابسته به بودجه

**budget data** *noun*

زانیاری دراونامە یان بودجە ◌ اطلاعات بودجه

**budgeteer** *noun*

دراونامەدانەر، بودجەدانەر ◌ واضع بودجه

**budgeting** /ˈbʌdʒɪtɪŋ/ *noun*

دراونامەدانان، رێکخستنی بودجە ◌ تنظیم بودجه

**budget line** *noun*

هێڵی دراونامە یان بودجە ◌ خط بودجه

**budget surplus** *noun*

زیدەبایی دراونامە یان بودجە ◌ مازاد بودجه

**budgie** /ˈbʌdʒi/ = budgerigar

**budworm** *noun*

کرمی خونچە یان غونچە، کرمی چرۆ (پروانە tobacco budworm و spruce budworm) ◌ کرم غنچه

**buff**[1] /bʌf/ *noun, adjective*

*n* 1 کەوڵ یان پێستی گامێش 2 رەنگی زەردی پرتەقاڵی، رەنگی زەردی تەڵخ یان ئێل *adj* زەردی ئامال قاوەیی ◌ *n* 1 چرم گاومیش 2 رنگ نخودی *adj* نخودی

**buff**[2] /bʌf/ *noun*

بەپەرۆش، تامەزرۆ، هۆگر، لایەنگر ◌ مشتاق، طرفدار، هواخواه

**buffalo** /ˈbʌfələʊ, US -loʊ/ *noun, pl.* same or buffaloes

گامێش، ماداک، مادەک، مانگ [ *Synceros caffer* و توخمی *Bubalus* (هیند و باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا، چوار جۆرن)] ◌ گاومیش

**buffalo fish** *noun*

گـامێش‌ماسـی (لـج‌ئـەسـتوور و هـێـی ئـاوە شـیرینەکـانی ئـەمریکای بـاکووری [تـوخم *Ictiobus*: چەندین جۆرن]) ◌ نوعی ماهی

**buffalo grass** *noun*
1 گیاگامێش؟: گیـایێکی خـشۆکی دەشـتەکانی ئەمریکای باکووری [*Buchloe dactyloides*] 2 جـــۆرێ گیـــای ئەوســـترالیا و نیوزیلەنـــد [*Stenotaphrum secundatum*] ◌ نوعی گیاه

**buffer**[1] /ˈbʌfə(r)/ *noun*
1 زەربەگیرەوە، زەبرگر، کوتبەند، کوت‌گیر، لێدانگر، پارێزە، زەربەخۆر، جیاکەرەوە، ناوبرە، نێوانگر، پارێزەک 2 بافێر، کوت‌بەند، کوت‌گیر، (هەروەها buffer solution) گیراوەی کوت‌بەند یـان کـوت‌گـیر یـان بـافێر: گـیراوەیـێ کـە بەرهەڵـستی گۆڕان لە pH دەکا کاتێ ترشەڵۆک یان ئەلکالی پێی زیاد دەکرێ 3 = buffer state (buffered *adj*) ◌ 1 ضربەگیر، حائل، میانگیر 2 بافر، محلول بافر

**buffer**[2] /ˈbʌfə(r)/ *noun*
(نافەرمی) مرۆی لێنەوەشاو یا ساویلکە، خەرەفاو (ب.ت. پیر) ◌ آدم بی‌کفایت یا سادە، خرفت

**buffer solution** *noun*
گیراوەی بافێر، گیراوەی کوت‌بەند یان کوت‌گیر ◌ محلول بافر

**buffer state** *noun*
ولاتی بەربەستە (یـان بـێ‌لایـەن لـە نێـوان دوو ولاتی بەهێزدا)، ولاتی نێوانگر ◌ کشور حائل

**buffer zone** *noun*
ناوچەی بێ‌لایەن (نێوان دوو ولات) ◌ منطقـەی بی‌طرف

**buffet**[1] /ˈbʊfeɪ, ˈbʌfeɪ, US bəˈfeɪ/ *noun*
بووفە، واگۆنی بووفە، دۆلاب، قەفەسـە ◌ بوفـە، واگن بوفە، قفسە

**buffet**[2] /ˈbʌfɪt/ *noun*
لێدان، پیاکێشان، سـیخورمە، مـستەکۆلە، کـولم، تقورچ، جەزرەبە، مشت ◌ ضربە، سقلمە، مشت

**buffet**[3] /ˈbʌfɪt/ *noun*
(لـە سـکاتلەند) کورسـی یـان بالـنج hassockی نزم ◌ بافت

**buffet car** /ˈbʊfeɪ kɑː(r), ˈbʌfeɪ, US bəˈfeɪ/ *noun*, also -et sideboard
واگۆنی بووفە ◌ واگن بوفە

**buffing wheel** *noun*
چەرخی سماتە یان پەرداخ ◌ چرخ سنبادە

**buffeting** /ˈbʌfɪtɪŋ/ *adjective, noun*
*adj* توند *n* 1 پیاکێشان 2 لەرینەوەیەکی نارێک لە بەشێ لە فڕۆکە لەبەر خراپی بارودۆخی هەوا ◌ *adj* شدید *n* 1 کوبش 2 بافتینگ

**buff leather** *noun*
چەرم یان پێـستەی گامێش ◌ چرم گاومیش

**bufflehead** /ˈbʌf(ə)lhɛd/ *noun*
سەرگامێشە (جۆرێ مراوی چکۆلە، پێوەندی بە goldeneyeـەوە هەیە [*Bucephala albeola*]) ◌ نوعی مرغابی

**buffo** /ˈbʊfəʊ/ *noun* (*pl.* buffos), *adjective*
*n* بەشـێکی بـەرمی یـان کۆمیـک لـە ئـۆپێرای ئیتالیایی‌دا *adj* سەربە ئۆپێرای کۆمیکی ئیتالیایی ◌ بوفو

**buffoon** /bəˈfuːn/ *noun*
تەڵخەک، گاڵتەچی، گۆسارتمە، کۆسە، تیتاڵباز ◌ دلقک، لودە

**buffoonery** / bəˈfuːnəri/ *noun*
گەپجاری، گاڵـتەجاری، تیتاڵبازی ◌ لـودگی، مسخرگی

**buff wheel** *noun*
چەرخی سماتە یان پەرداخ ◌ چرخ سنبادە

**bug** /bʌg/ *noun*
1 (مێروناسی) جانەوەر، ئاخۆرە؟، جووجە، سن (aphid ـەکان، leafhopper ـەکان، cicada و زۆر مێـــرووی تـــر دەگرێتـــەوە [دەســـتە Hemiptera]) 2 بەچکـەمێروو، مێرووچکـە 3 (نافـەرمی) هـەر مێروویێکـی ورد 4 میکـرۆب، ڤایرۆس، هـەر جانـەوەرێکی ورد، زینـدەوەری زیانـاوی، نەخۆشـی ڤایرۆسـی یـا میکـرۆبی، نـەخۆشـی‌یێ کـە بـەهـۆی وردەزیندەوەرێکەوە تووش دەبێ 5 کێشە، گیر، ئیرۆر، گرفت (ب.ت. کامپیوتێر) 6 میکرۆفۆنی (چکۆلە) شاراوە (بۆ مەبەسـتی سـیخوڕی و تۆمـارکردنی دەنـگ): 7 *They planted a bug in his hotel room* *the travel bug* : (نافەرمی) تامەزرۆیی، تاسە ◌ 1 سـاس 2 (عامیانە) هر حشرەای ریز 3 حشرەی کوچک 4 میکروب، ویروس، بیماری ویروسـی یـا میکروبی 5 اشکال، نقص 6 باگ 7 اشتیاق

**bugaboo** /ˈbʌgəbuː/ *noun*
(زۆرتر لە ئەمریکا) دێو، دەعبا ◌ غول

**bugbane** *noun*
(رووەک‌ناسی) گاوکەکوژە؟: جۆرێ گیـای درێژ بە هێشووە گوڵی زەرد و کرێمی‌یەوە و گەڵاکانی شێوەی سەرەخسێ دەدەن، جاران بۆ دەرکردنی یـان فـەوتاندنی گـاوک و جووجـەی سـەرجێی بـەکـاردێترا [*Cimifuga foetida* و جـۆرە پێوەندی‌دارەکان] ◌ نوعی گیاه

**bugbear** /ˈbʌgbeə(r), US -ber/ *noun*
مایەی نیگەرانی، دڵەڕاوکێ، دڵەڕاوکە، بێزاری و ترس: *Inflation is the government's main bugbear* ◌ مایەی دلواپسی، انزجار و هراس

**bug-eyed** *adjective*
چاوزەق، چاوبۆق، چاودەرپەڕیو، چاوهەڵماسیو ◌ چشم‌ورقلمبیدە

**bugger**[1] /ˈbʌgə(r)/ *noun*
1 نێربـاز (sodomite) 2 کـەسـێکی هـیچ یـان قێزەون 3 بارگین ◌ 1 لواطکـار 2 آدم نـاچیز یـا

نفرت‌انگیز 3 یابو

**bugger**[2] /'bʌɡə(r)/ *interjection*
تف، ئەهـ ◌ تف، اه

**bugger all** *noun*
هیچ شتێ :nothing *There's bugger all on TV tonight* ◌ هیچ‌چیز

**buggered** /'bʌɡəd, US -ɡərd/ *adjective*, be buggered
خراپ‌بوو، تیاچوو، پەک‌کەوتوو، شر، ماندوو، شەکەت، لەپێ‌کەوتوو: *Oh no, the TV's buggered* ◌ نابودشده، خسته

**buggery** /'bʌɡəri/ *noun*
نێربازی، کاری سێکس لە دواوە، sodomy ◌ لواط، وطی دُبر

**bugging devices** *noun*
ئامێر یان دەزگاکانی گوێ‌هەڵخستن ◌ وسایل استراق سمع

**buggy**[1] /'bʌɡi/ *noun*
1 (مێژوویی) کالیسکەی یەک‌ئەسپە 2 کالیسکەی قەدکراوی منال، کالیسکەی منال ◌ بوگی

**buggy**[2] /'bʌɡi/ *noun*
1 داوەشاو لەبەر مێروو، مێرووتێداو 2 شێت ◌ 1 دارای حشره 2 دیوانه

**bughouse** *noun*
(نافەرمی) شێت‌خانە، نەخۆش‌خانەی شێتان ◌ تیمارستان

**bugle**[1] /'bju:ɡl/ *noun*
(هەروەها bugle-horn) شەیپوور، بوری ◌ شیپور

**bugle**[2] /'bju:ɡl/ *noun*
جۆرێ گیای خشۆک، بە گوڵی شینەوە لەسەر لاسکێکی راست [Ajuga reptans و جۆرەکانی تر] ◌ نوعی گیاه

**bugle**[3] /'bju:ɡl/ *noun*
جۆرێ مووروویی لوولەئاسا بۆ سەر کراس ◌ بوگل

**bugler** /'bju:ɡlə(r)/ *noun*
شەیپوورژەن، شەیپوورچی، بوریژەن ◌ شیپورچی

**bugleweed** = bugle 2

**bugloss** /'bju:ɡlɒs/ *noun*, also Italian bugloss
گوزروان، گوزروانە، گوڵ‌گاوەزوان، گادمە، زمانەگا، گاوزبان، مژمژە، مزمزۆک، بن‌گوزروان [Anchusa arvensis و جۆرەکانی تر] (بنەڕەت: لە buglosse فەرەنسی کۆن یان لە buglossus لاتینی، لە bouglōssos یۆنانی "گازمان" "ox-tongued"، لە bous "گا" + glōssa "زمان") ◌ گاوزبان

**build** /bɪld/ *noun*
ئەندام، هەیکەل، قیافە، بنگە، شێوە، بیچم، بەیکەر، چێوە، چوارپەل، داروبار، پێکهاتە، پێکهێنان ◌ هیکل، شکل، ساخت، ترکیب

**builder** /'bɪldə(r)/ *noun*
کۆنتراکت‌کار، بڕکار، سازەر، سازێنەر، دروسکەر، پێکهێنەر، بنیاتنەر، (لە لێکداندا) ـ ساز یان دروسکەر، ـچی ◌ پیمانکار، سازنده، ـساز

**building** /'bɪldɪŋ/ *noun*
1 خانووبەرە، بنیات، بنیاد، دەزگا، خانی، ماڵ، بالاخانە: *the tall/old/historic buildings* ◊ *There's building work going on next door* 2 خانەسازی، قورەکاری، خانوو دروست‌کردن: *the building of the school* ◊ *the building trade* ◌ 1 ساختمان، بنا 2 ساختمان‌سازی

**building block** *noun*
1 بەش (پێکهێنەر)، بەشە پێکهێنەرەکان، بەشە دروسکەر یا سازێنەرەکان 2 بلۆکی خانووبەرە ◌ 1 عنصر، اجزا سازنده 2 بلوک ساختمانی

**building materials** *noun, pl.*
کەرەسە یان کەل‌وپەلی خانووبەرە، پێکرد، بەرکاری خانوو ◌ مصالح ساختمانی

**building site** *noun*
ناوچەی خانووبەرە (لێ‌دروست‌کردن) ◌ سایت بلدینگ

**building society** *noun*
رێکخراوەی خانووبەرە یان خانووکڕین (کە لە بانکێش دەچێ) ◌ سازمان مسکن

**build-up** *noun*
1 کۆکردنەوە، کۆبوونەوە، کەڵەکەکردن، کەڵەکەبوون، خنین: *carbon dioxide build-up in the atmosphere* 2 دانان، دروست‌کردن، بنیاتنان، سازکردن 3 پڕوپاگەندە، بانگەشە (بەرپلاو)، پیاهەڵدان، وروژاندن، تاریف(دان) 4 ئامادەکاری، بەرهەڤ‌کاری (کەم‌کەمە): *the build-up to her wedding* 5 زۆربوون (پلەپلە)، زیادکردن: *a steady build-up of traffic in the evenings* 6 هەڵدان، گەشەکردن ◌ 1 انباشت، تجمع 2 عمل ساختن 3 تبلیغ، تعریف 4 تدارک 5 افزایش 6 رشد و نمو

**built**[1] /bɪlt/ *adjective*
1 پێهاتوو، دروست‌کراو، بنیات‌نراو، سازکراو 2 (لە لێکداندا) ـپێکهاتە، ـپێکهاتن، ساز، کرد، کار: *a newly built station* ◊ *American-built cars* ◌ 1 ساخته 2 ـساخت

**built**[2] /bɪlt/ – past and past participle of build

**built-in** *adjective*
1 نێوکار، نێودیواری، کاری نێوەوە: *built-in cupboards* ◊ *a computer workstation with a built-in telephone, answering machine and fax* 2 نێوەکی، کرۆکی، زاتی، خودایی ◌ 1 توکار 2 ذاتی، جبلی

**built-up** *adjective*
پێکهاتوو لە، دروس‌بوو لە، دروست‌کراو،

*to reduce the speed limit in* :پێکهاتوو
متشکل از، مرکب از، ساخته ◌ *built-up areas*

**bulb** /bʌlb/ *noun*
1 پیواز، پیاز، پێواز، سەلک، بن، کلاوە، بەندک 2 گڵۆپ 3 سەلکە (تێرمۆمیتر؛ بنەڕەت: بە ڕیگای لاتین لە *bolbos* یونانی "پیاز، ریشەی بەبن") ◌ 1 پیاز (گل) 2 لامپ 3 مخزن (دماسنج)

**bulbil** /ˈbʌlbɪl/ *noun*
پیوازۆکە، بنۆچکە، پیازۆکە، سەلکۆچکە ◌ پیازک

**bulbourethral gland** = Cowper's gland

**bulbous** /ˈbʌlbəs/ *adjective*
1 پیوازدار، سەلکدار، بەبن، بندار، پیوازی، پیازی، سەلکی، سەلکئاسا 2 خڕ و قەڵەو (ناحەز)، سەلکەشەلەمی: *a -s nose* ) bulbously (*adv* ◌ 1 پیازدار، پیازی 2 گرد و قلبە

**bulbous bluegrass** *noun*, also bulbous meadow grass
(رووەکناسی) واشێرە، واشێرە ◌ چمن پیازکدار

**bulbul** /ˈbʊlbʊl/ *noun*
(گیانەوەرناسی) بولبول، سەرخوونک، واف [خێزان Pycnonotidae: گەلێ جۆرن] ◌ بلبل

**Bulgar** /ˈbʌlgə(r)/ = Bulgarian

**Bulgarian** /bʌlˈgeərɪən/ *adjective, noun*, also Bulgar /ˈbʌlgə(r)/
*adj* بولگاری، سەربە بولگاریا *n* 1 زمانی سلاڤی باشووری بولگاری 2 خەڵکی بولگاری ◌ *adj* بلغاری *n* 1 زبان بلغاری 2 اهل بلغارستان

**bulgar wheat** /ˈbʌlgə/ *noun*, also bulgur wheat
ساوەر، بەتلە؟ (لە گەنمی نەکوڵاو "کالەبرویش") ◌ گندم بلغور

**bulge** /bʌldʒ/ *noun*
1 هەڵتۆقیوی، هەڵقولتاوی، زگدان، نوهوم، تەبلک، هەڵتۆقیوی، پەڵمان، ورگدان، گووپدان، پەنەمیان، دەرپۆقیوی، دەرپۆقین، ماسین، باکردن، هەڵماسین، هەڵماسیوی، گوپ، دەرپەڕیوی، بلۆق، کیس: *the bulge of a gun in his pocket* 2 (نافەرمی) تۆقینەوە، زۆربوونی ناکاو و کاتی: *After the war there was a bulge in the birth rate* ◌ 1 برآمدگی، تحدب، برجستگی، شکم، قلنبەشدگی 2 افزایش ناگهانی و موقت

**bulged** *adjective*
پڕ، تژی، دارماڵ، خنراو ◌ پر، مملو

**bulginess** *noun*
ورگدان، هەڵماسین، دەرپۆقین، دەرپەڕین، هەڵقولتان ◌ برآمدگی

**bulging** /ˈbʌldʒɪŋ/ *adjective*
پڕ، تژی، دارماڵ، ئاخنراو ◌ پر، انباشە

**bulgy** *adjective*
هەڵماسیو، ورگداو، دەرپەڕیو، دەرپۆقیو ◌ متورم، برآمدە

**bulimarexia** /bjʊˌlɪməˈreksɪə, US bʊ-/ = bulimia

**bulimia** /bʊˈlɪmɪə, US bju-, -ˈliːmɪə/ *noun*, also bulimia nervosa
برسانەوە، پرێشتیایی دەروونی (تێکهەڵکێشی برسێتی و ڕشانەوە)، بیولیمیا، بولیمیا (تێکچوونێکی سۆزەکی emotional کە لەودا نەخۆشەکە بۆ چەندین جار یەکجار زۆر دەخوا و پاشان خۆی ناچار دەکا بڕشێتەوە) ◌ جوع

**bulimic** /bʊˈlɪmɪk, US bju-, -ˈliːmɪk/ *adjective, noun*, also bulimious
*adj* برسانەوەیی، بولیمیک، بولیمیایی *n* نەخۆشێ کە تووشی ئەو دەردە بووە ◌ *adj* وابستە بە جوع *n* بیمار مبتلا بە جوع

**bulk** /bʌlk/ *noun*
1 گەورەیی، زلەیی، زەلامی، زلی، قەبەیی: *Despite its bulk and weight, the car is extremely fast* 2 بڕیکی زۆر: *It's cheaper to buy in bulk* 3 هەیکەل، قیافە 4 بارستە، ئەندازە، بارستایی 5 بەشی سەرەکی، پشکی بنگەهی: *The bulk of the population lives in cities* 6 کەلوپەل یان شمەکی هەڵڕژاو، هەرەمە، گۆترە ◌ 1 گندگی، بزرگی 2 جثە 3 مقدار زیاد 4 حجم 5 قسمت عمدە 6 کالای فلەای

**bulk buying** *noun*
کۆکڕی، زۆرکڕی، کڕین بە بڕێکی زۆر، کڕین بە جوملە ◌ عمدەخری

**bulkhead** /ˈbʌlkhed/ *noun*
مانە، تیغە، ناوبرە، زەمۆمە، دیوار، بەربەست ◌ تیغە، حائل، جدار

**bulky** /ˈbʌlki/ *adjective* (bulkier, bulkiest)
1 زلە، زل، قەبە، گەورە، زەلام، گەپ، تاپاز، نابار، بارناخۆش، کەرکەنۆڵ، زۆرجێگر، جێبەر، جێگر: *Bulky items will be collected separately* 2 هەیکەلی، زلە، زەبەلاح: *The bulky figure of Inspector Jones appeared at the door* 3 (کتێب) ئەستوور، زلە ◌ 1 گندە، بزرگ، پرحجم 2 تنومند 3 قطور

**bull**[1] /bʊl/ *noun, adjective*
*n* 1 جوانەگا، وەرزا، وەرزە، جەل، بەرجووت، کەڵ، کەلەگا، نێرەگا، نێرەفیل، نێرەنەهەنگ (گیانەوەرە زلەکانی تریش) 2 (لە بازاڕی سەهامدا) کەسێ کە بەشەکان یان پشکەکان دەکڕێتەوە بەو هیوایە بەزوویی بە نرخێکی سەرتر بیانفرۆشێتەوە)، شینکڕی پشکەکان، شینکڕی بەشەکان یان سەهام 3 (ڕەمەکی) پاسەبان، پۆلیس، ئاژان، police officer، detective 4 کەسێ کە شێوەی گا دەدا (وەک لە ناقەت و هێزدا) *adj* نێر، نێرینە: *a bull calf* وەک گا، گایی، گا بیر دەخاتەوە یان ئامازە بەوە

⟐ *n* 1 گاو نر، فیل نر، نهنگ نر 2 سلفخر سهام 3 پاسبان 4 آدمی که به نرهگاو میماند *adj* نر، مربوط به گاو نر، اشارهکننده به گاو

**bull**[2] /bʊl/ *noun*

فەرمان، دەستوور (دەستووری فەرمی یان راگەیاندن و لێدوانێ لە لایەن پاپەوە): *a papal bull* ⟐ فتوا

**bull**[3] /bʊl/ *noun*

قسەی هیچەکە، هەلیتوپلیت ⟐ حرف مفت، چرتوپرت

**Bull** /bʊl/ *noun*

گا (دووەمین کەلوو لە زۆدیاک، هەروەها Taurus) ⟐ ثور

**bulla** /ˈbʊlə/ *noun, pl.* bullae /ˈbʊliː/

1 (پزشکی) توقلە، بلۆق (هەوا یا شلەی تیایە) 2 (تویکاری) دەرپەڕیوی خڕ، قوتکە، گرێ، لک، لوو 3 مۆری خڕی سەر فەرمانی پاپ ⟐ بولا

**bullate** *adjective*

(رووەکناسی) قوتکەدار، گرێدار، گرێگرێ، لوواوی ⟐ بولیت

**bullace** /ˈbʊlɪs/ *noun*

هەلووژە، هەلووچە [*Prunus insititia*] ⟐ آلوچە

**bull ant** = bulldog ant

**bull bar** *noun*

تۆری میلی (یان میلمیل) پێشەوەی ماشێن ⟐ بول بار

**bull capital** *noun*

سەرکۆلی کەللەگایی ⟐ سرستون کلەگاوی

**bulldog** /ˈbʊldɒg, US -dɔːg/ *noun*

1 بۆلداگ، گاسەگ 2 (لە زانکۆکانی ئاکسفۆرد و کەمبریج) دواچاودێر، یاریدەدەری چاودێر ⟐ 1 بولداگ 2 کمک مراقب

**bulldog ant** *noun*

مێروولە گاسەگ(انە) [توخم *Myrmecia*] ⟐ مورچەی بولداگ

**bulldog bat** *noun*

شەمشەمەکوێرەی ماسیگرە یان ماسیخۆرە، رەسەنی ئەمریکای باشووری و ناوەندی [*Noctilio leporinus*] ⟐ نوعی خفاش

**bulldog clip** *noun*

گیرەی کاغز، کاغزبەست، کاغزبەند، کاغزگیر ⟐ گیرەی کاغذ

**bulldozer** /ˈbʊldəʊzə(r), US -doʊz-/ *noun*

1 زادەر، خاکمال، رامالە 2 کەسێ کە بە هەرەشە و ترساندن بیهەوێ کارێ بکا؛ شتێ یان کەرەسەی هەرەشە و ترساندن 3 دەزگای ئاسنگەری، کوورەی ئاسنگەری 4 دەزگایێ کە بارودۆخ و رەوشی شتێ دەگۆڕێ ⟐ 1 بولدوزر 2 بولدوزر، وسیلەی ارعاب و تهدید 3 و 4 بولدوزر

**bullet** /ˈbʊlɪt/ *noun*

1 گوللە، بەرک، قیشەک، تیر (خلێرە = round 2 (bullet the bulley) دەرکردن، لابردن (لەسەر کار) ⟐ 1 گلولە 2 عزل

**bulletin** /ˈbʊlətɪn/ *noun*

1 ئاگاداری، هایداری، هەواڵنامە، پەیامنامە، نامیلکەی پەیامەکان، بەلاڤۆک 2 راپۆرتەهەواڵ ⟐ 1 اطلاعیە، خبرنامە 2 گزارش خبری

**bulletin board** *noun,* also noticeboard

شوێنێ لە کامپیوتێردا کە هەر بەکارهێنەرێ دەتوانێ لێیبنووسێ یان پەیامێ لێ بخوێنێتەوە ⟐ بولتن بورد

**bullethead** *adjective*

1 سەرخڕ، نووکخڕ 2 گەوج، لاسار، کەللەڕەق ⟐ 1 دارای نوک مدور 2 احمق، لجباز

**bullet-proof** /ˈbʊlɪtpruːf/ *adjective*

دژەگوللە، گوللەگیرەوە ⟐ ضد گلولە

**bullet train** *noun*

جۆرێ ترێنی سواری تونرەوی ژاپۆنی ⟐ نوعی ترن سریع‌السیر

**bull fiddle** = double-bass

**bullfight** /ˈbʊlfaɪt/ *noun*

گاسواری، شەڕەگا، شەڕەکەڵ ⟐ گاوبازی

**bullfighter** *noun*

گاسوار، گاباز، شەڕەگاکار، شەڕەگاچی، بولفایتێر ⟐ گاوباز

**bullfighting** *noun*

گاسواری،شەڕەگا ⟐ گاوبازی

**bullfinch** /ˈbʊlfɪntʃ/ *noun*

(گیانەوەرناسی) سەیرەی جێرەیی [*Pyrrhula pyrrhula* و جۆرەکانی تر] ⟐ سهرەی صورتی

**bullfrog** /ˈbʊlfrɒg, US -frɔːg, -fruːg/ *noun*

(گیانەوەرناسی) بۆقەزلە، گابۆقە، بۆقی ئەمریکایی [*Rana catesbiana* (ئەمریکای باکووری) و جۆرەکانی تری شوێنەکانی دی] ⟐ بولفراگ

**bullhead** *noun*

1 مرۆی گاسەر، مرۆی کەللەڕەق یان لاسار 2 ماسیسەرگا، کەللەگاوی: چەندین جۆری ماسی کەللەزل (وەک sculpin)، ب.ت. چەند جۆرێکی ماسی ئاسایی ئاوە شیرینەکانی ولاتە یەکگرتووەکان، یان نقەی catfish ئاوە شیرینەکانی ئەمریکا [توخم *Ameiurus*، جاروبارێش *Ictalurus*] ⟐ 1 آدم لجباز، آدم کلەشق 2 نوعی ماهی

**bullheaded** /ˌbʊlˈhedɪd/ *adjective*

گاسەر، کەللەشەق، کەللەڕەق، لا، لاسار ⟐ لجباز، کلەشق

**bullhorn** /ˈbʊlhɔːn, US -hɔːrn/ = loudhailer, megaphone

**bullion** /ˈbʊliən/ *noun*

کەستەک، دارشتە، قورسە ⟐ شمش

**bullish** /'bʊlɪʃ/ *adjective*
1 هیوادار، گەشبین 2 (بازاڕ) گەرم، رووڵەگەشە، رووڵەگرانی (چوونەسەرتری نرخەکان) (دارایی ب.ت. لە بازاڕی ستاکدا): *bullish inventors* 3 گائاسا (*bullish policies* bullishly /'bʊlɪʃli/ *adv* / bullishness /'bʊlɪʃnəs/ *n*) ۞ 1 امیدوار 2 روبەترقی 3 گاومانند

**bull market** *noun*
بازاڕی رووڵەگەشە (یان پەرە)، بازاڕی رووڵەگرانی، بازاڕگەرمی ۞ بازار روبەترقی

**Bull Moose** *noun*
لایەنگری تیۆدۆر روزڤێلت Theodore Roosevelt لە شالاو یان چالاکی‌یەکانی هەڵبژاردنی سەرۆک‌کۆماری ئەمریکا لە 1912 (*bull moose*: نیشانەی پارتی پێشکەوتن‌خوازی 1912) ۞ بول موس

**bull neck** *noun*
1 ملی گا 2 ملی کورت و ئەستوور و بەهێز، ملی تاجۆیی 3 جۆرێ مراوی تەوقی ۞ 1 گردن گاو 2 گردن کوتاه و کلفت 3 نوعی مرغابی طوقی

**bullnecked** *adjective*
مل‌کورتی ئەستوور، مل‌تاجۆ ۞ دارای گردن کوتاه و کلفت

**bull-nose** *noun*
(تکنیکی) ئاست یان شتی بن‌پان ۞ سطح یا چیز تەپهن

**bull-nosed** *adjective*
بن‌پان ۞ تەپهن

**bullock** /'bʊlək/ *noun*
1 گای یەختە (ئیختە) یان خەساو 2 گوێلک، گوێرەکە (نێر) ۞ 1 گاو اختە 2 گوسالە

**Bullock's oriole** *noun*
زێرینچە یا هەنجیرخۆرەی بۆلۆکس [*Icterus bullockii*] ۞ نوعی پرندە

**bullous** *adjective*
(پزشکی) توقڵەدار، بلۆقاوی، vesicular: *bullous lesions* ۞ بولوس

**bullring** /'bʊlrɪŋ/ *noun*
شەرەگاخانە، گۆرەپان یان مەیدانی شەرەگا ۞ میدان گاوبازی

**bullrush** = bulrush

**bull season** *noun*
(نافەرمی) بۆنەیێ کە خەڵک یەک‌دەبینن و لەگەڵ یەک بە شێوەیەکی نافەرمی‌یەوە قسە ئەکەن ۞ بول سیسن

**bull's-eye** /'bʊlzaɪ/ *noun*
1 خاڵی نیشانە، تیرنیشان، خاڵی نیوەندی، چاوەکەڵ، چاوەگا، دڵی نیشانە، خاڵی ئامانج 2 دەربیجە یان پەنجێرەی خڕ، دەلاقە 3 جۆری نوقڵی تام‌جاترەیی زلە و رەقە ۞ 1 خال هدف 2 نورگیر 3 نوعی شکلات

**bullshit** /'bʊlʃɪt/ *noun*
قسەی هیچەکە، هەڵسیت‌وپڵیت، فڵتە ۞ چرت‌وپرت، مزخرف

**bull snake** *noun*
گامار؟ (جۆرێ ماری تێئالاوی دەشتەکانی ئەمریکای باکووری [*Pituophis catenifer sayi*]) ۞ نوعی مار

**bull terrier** *noun*
گاتاجی (دوورەگەی بولداگ و تاجی) ۞ نوعی سگ شکاری

**bull trout** *noun*
گاکەشینە، کەشینەگایانە [*Salvelinus confluentus*] ۞ نوعی قزل‌آلا

**bully**[1] /'bʊli/ *noun, pl.* bullies
کەڵەگا، ملهوڕ، زەبوون‌کوژ ۞ قلدر، گردن‌کلفت

**bully**[2] /'bʊli/ *adjective*
(نافەرمی، ئەمریکا) یەکجار باش، عال ۞ عالی

**bully**[3] /'bʊli/ *noun,* also bully beef
(نافەرمی) گۆشتی خوێ‌پێوەکراو ۞ گوشت نمک‌سود

**bully-boy** *noun*
کەڵەگا، ملهوڕ، زەبوون‌کوژ ۞ بزن‌بهادر، گردن‌کلفت

**bullying** *noun*
کەڵەگایی، ملهوڕی، زەبوون‌کوژی، گەڕوگێچەڵ ۞ قلدری، گردن‌کلفتی

**bulrush** /'bʊlrʌʃ/ *noun,* also bullrush
قامیش، چیت، ژاژ، لەقەل، لەبان، لەوەن، جگەن، سێسوو؟، گیاحەسیر، پیزاڵ، پیزڵ ۞ نی، نی علف، بوریا، جگن، پیزر

**bulwark** /'bʊlwək, US -wɜːrk/ *noun*
1 شوورە، دیوار (بەرگری)، سەنگەر، بەربەستی بەرگری، پەنا 2 مەترسی‌گیرەوە 3 پارێزەر، پارێزکار، پشتیوان، لایەنگر، نۆبەدار 4 کەڵبەرە، کەڵەرە، شەپۆل‌رەوێن 5 (کەشتی) دیوار(ە)، بەشێ لە تەنیشتی کەشتی لەسەر رووی پشتی کەشتی‌یەوە ۞ 1 خاکریز، دیوار 2 سپربلا 3 محافظ، حامی، نگهبان 4 موج‌شکن 5 بولوارک

**bum**[1] /bʌm/ *noun*
(لە بریتانیا و نافەرمی) سمت، پاشل، کنگ، روونەک، کۆم ۞ لمبر، سُرین، مقعد

**bum**[2] /bʌm/ *noun, adjective*
*n* 1 سوالکەر 2 مفتەخۆر 3 ئاوارە، بێ‌ماڵ‌وحاڵ، تەرە، هەڵوەدا 4 کەسێکی تەمەڵ و بێکارە 5 ئاوارەیی، هەڵوەدایی، تەرەیی، بێ‌ماڵ‌وحاڵی *adj* 1 بێ‌قازانج، بەکارنەهاتوو، ئایەخ، خراپ، بێ‌کەڵک 2 سەرەوەندەرنەکردوو ۞ *n* 1 گدا 2 مفت‌خور 3 آوارە 4 آدم تنبل 5 آوارگی *adj* 1 بی‌فایدە 2 ناوارد

**bum-bag** /'bʌmbæg/ *noun*
جانتای بەرپشتێنە، جانتا یان کیفی کەمەر ۞

کیف کمری

**bumbershot** *noun*
(نافەرمی، ئەمریکا) چەتر (بنەڕەت: گۆڕاوی ((para)chute + umbrella ◌ چتر

**bumblebee** /ˈbʌmblbiː/ *noun*
هەنگەزلە، گونشێر، ژەنگەسووره، ویزنە (بە ویزەویزێکی زۆرەوە [تـوخم *Bombus*: زۆر جۆرن]) ◌ زنبور درشت

**bumbling** /ˈbʌmblɪŋ/ *adjective*
ناشی، دەستەوسان، بەیدەس ◌ ناشی

**bumboat** /ˈbʌmbəʊt/ *noun*
بەلەمی ئازووقە، گەمی سووروسات ◌ قایق سورسات‌فروشی

**bumf** /bʌmf/ *noun*, also bumph
1 شرەبەلگە، شرەکاغز، شرەوبرە، لەتەکاغز 2 کاغزی دەس‌بەئاو ◌ 1 خرت‌وپرت (نوشته) 2 کاغذ توالت

**bumfluff** /ˈbʌmflʌf/ *noun*
(نافەرمی، بریتانیا) گەندەموو ◌ اولین موی نوجوان

**bummalo** /ˈbʌmələʊ/ *noun, pl.* same
جۆرێ ماسی چکۆلەی ئاسیای باشووری، وشک دەکرێتەوە (وەک قاورمە) [*Harpodon nehereus*] (بنەڕەت: رەنگە لە *bombīl* ماراتی Marathi یەوە وەرگیرابێ) ◌ بومالو

**bummer** /ˈbʌmə(r)/ *noun*
رەوشی ناخۆش و هیوابڕ، هەلومەرجی تاڵ و ناخۆش، دەردەسەر، ئەشکەنجە، دەرد، گیرەوکێشە، چەلەمە: *It's a real bummer that she can't come* ◌ وضع ناخوشایند و مأیوس‌کننده، عذاب، مکافات

**bump** /bʌmp/ *noun, adverb*
*n* 1 پێک‌کەوتن، لێک‌کەوتن (سووک)، لێدان، مشت، چەپۆکە 2 پەنەمان، ماس، ماسین، هەلماسین، هەلتۆقان، دەربەریوی، هەلتۆقیوی 3 چالیوجۆلی، ناریکی 4 تەکان یان جوولەی کت‌وپڕ (لە فرۆکەدا) 5 دەنگی بامب *adv* لەناکاو، لەپڕێکدا، کت‌وپڕانە ◌ *n* 1 تصادم، مشت، ضربه 2 برآمدگی 3 دست‌انداز 4 حرکت ناگهانی 5 صدای بامب *adv* ناگهانی

**bumper** /ˈbʌmpə(r)/ *noun, adjective*
*n* 1 پارێزە، سپەر 2 (لە مۆتۆر سیکلێتدا) زەمبەلەک یان فەنەری زەربەگیرەوە، زەربەگیرەوە 3 پیالە یان لیوانی پڕ *adj* 1 زەلام، گەورە، زەبەلاح، قەبە 2 زۆر، زەبەند، فراوان: *a bumper crop/harvest* ◌ *n* 1 سپر 2 فنر ضربه‌گیر، ضربه‌گیر 3 لیوان پر *adj* 1 گنده 2 وافر

**bumper car** = dodgem

**bumper-to-bumper** *adjective*
(هات‌وچۆ) پشت‌سەریەک، شلوق، چڕ، سەربەسەریەکەوەناو، پێکەوەنووساو ◌ سنگین،

فشرده

**bumph** = bumf

**bumpkin** /ˈbʌmpkɪn/ = country bumpkin

**bumptious** /ˈbʌmpʃəs/ *adjective*
بادی‌هەوا، بەدەمار، فیزن، لەخۆگۆڕاو، بەدەعیە، لەخۆبایی، بەدەمارانە، *a -ptious bureaucrat* : obtrusive ◌ مغرور، خودخواه، تکبرآمیز

**bumptiously** /ˈbʌmpʃəsli/ *adverb*
فیزنانە، لەخۆباییانە ◌ مغرورانه

**bumptiousness** /ˈbʌmpʃəsnəs/ *noun*
فیزنی، بەدەماری، بادی‌هەوایی، خۆبەزلزانی ◌ غرور

**bum steer** *noun*
(نافەرمی) پارچە زانیارێکی درۆ ◌ بخشی از اطلاعات کاذب

**bumpy** /ˈbʌmpi/ *adjective* (bumpier, bumpiest)
چالیوچۆلاوی، نارێک، پڕچاڵ‌وچۆڵ، پڕکەندولەند، قۆرتاوی، پڕکەندوکۆسپ ◌ ناهموار، پردست‌انداز، پرفرازونشیب

**bun** /bʌn/ *noun*
1 کەیک، (جۆرێ) کولێچە (خڕ و شیرین) 2 نانی خڕ 3 قوتکەقژ (توپە قژی قوتی دواوە) 4 (buns) پاشل، کنگ، سمت ◌ 1 کیک 2 بان 3 گوجه 4 (در جمع) سُرین

**bunch** /bʌntʃ/ *noun*
1 دەسک، دەستک، چەپک، گورزە، هووێژی، تاخە، لاگوێل، گولکم 2 دەستە، کۆمەل، جەماعەت، کۆمەلە 3 کۆما، کوگا 4 هێشوو، بۆڵ 5 جۆرێ شێوازی داهێنانی قژ کە لە هەر دوو لای سەر دەبەسرێ و قوت دەبێتەوە، کەروێشکی ◌ 1 دسته 2 گروه، مجموعه 3 کپه 4 خوشه 5 دم‌موشی

**bunch grass** *noun*
چەپکەگیا (بە چەپکی شین دەبێ و لە دەشتەکانی ئەمریکای باکووری [*Schizachyrium scoparium* و جۆرەکانی تر]) ◌ بانچ گراس

**bunchy** *adjective*
هێشوویی، لەهێشووچوو، شێوەهێشوو، بۆلی، بۆڵ‌ئاسا ◌ خوشه‌مانند

**bunco** *noun, pl.* buncos
(نافەرمی، ئەمریکا) دەسبڕی، کلاولەسەرنان، فێڵ ◌ شیادی، حیله

**buncombe** = bunkum

**bund** /bʌnd/ *noun*
(لە هیند و پاکستان) بەند، بەنداو (لە بەندەوە وەرگیراوە) ◌ سد

**bundle** /ˈbʌndl/ *noun*
1 گورزە، تاخە، دەستە، بەند، دەستەوارە، چەپک: *a bundle of rags/papers* 2 بوخچە، پرێسکە، بەستە 3 توپەل، کەلەکە، کۆما 4 لۆدەپوول،

کۆماپارە، بڕێکی یەکجار زۆری پارە ۞ 1 دستە 2 بقچە 3 کپە 4 پول هنگفت

**bundu** /ˈbɒnduː/ *noun*

(ئەفریکای باشووری) ناوچەی کاکیبەکاکی و دوور و چەپەک ۞ منطقەی برهوت و دور

**bung**[1] /bʌŋ/ *noun*

درگا، سەر، بان، توپەوانە، زارنـاخن، زاربـین، زمانە (بەرمیل، شووشە و هتد) ۞ در، سر

**bung**[2] /bʌŋ/ *noun*

(نافەرمی) بەرتیل، دەمشیرینی ۞ رشوه

**bung**[3] /bʌŋ/ *adjective*

بەکارنەهاتوو، خراپ، کاول، ویران، broken ۞ بدردنخور، ویران

**bungalow** /ˈbʌŋɡələʊ, US -loʊ/ *noun*

خانووی یەکنهۆم ۞ خانەی ویلایی

**bunged up** *adjective*

ریبۆقاوی، ریبۆقکردوو (چاو) ۞ قیکرده

**bungee** /ˈbʌndʒi/ *noun*, also bungee cord or rope

تەنافی خۆبەردانەوە (خواری، کێشی دێ) ۞ بانگی

**bungee jumper** *noun*

خۆهەڵدەر، لە بەرزاییەوە بازدەر ۞ بانگیجامپر

**bungee jumping** *noun*

خۆهەڵدان، لە بەرزاییەوە بازدان (وەکوو پرد، هەڵـدێر (بـەهۆی تـەنافی جـیری‌یـەوە) ۞ بانگیجامپینگ

**bunghole** *noun*

کونی بەرمیل یان بۆشکە ۞ سوراخ بشکه

**bungle** /ˈbʌŋɡl/ *noun*

گووکـاری، فـشـەکاری، کارپیـسی، تیـریان، ترەکەڵەک، کاری سەرسەرەکی، کاری فشە ۞ سرهمبندی، کار سرهمبندیشده

**bungled** *adjective*

تێرپاو، گووتێکراو، سەرهەمبەندی، سەرسەرەکی، فشە، ترەکەڵەک، خراپکراو ۞ سرهمبندیشده، ضایعشده

**bungler** /ˈbʌŋɡlə(r)/ *noun*

بنیادەمی گووکار، سەرهەمبەند، مرۆی گووتێکەر، کارپیس، کارگلاو، کارگوواوی ۞ آدم سرهمبند

**bungling** *adjective, noun*

*adj* سـەردەنەچوو، ناشـی، سـەرەندەرنەکردوو، کارپیس *n* گووکاری، تێریان، کارپیـسی ۞ *adj* ناشی *n* افتضاح

**bunion** /ˈbʌnjən/ *noun*

بـانیۆن (= ماسـینێکی بـەژان لـە پـێ ب.ت. قامکەگەورە) ۞ بونیون

**bunk**[1] /bʌŋk/ *noun*

(شەمەنەفەر، کەشتی و کاراڤان) تەختی دیواری، تەختی دوونهۆم ۞ تختوخواب دیواری، بانک

**bunk**[2] /bʌŋk/ *noun*

قـسەی هیچەکە، هەڵـیتوپـڵیت، درۆ و دەلەسە ۞ مزخرف

**bunk**[3] *noun*, do a bunk

تـێقووچانـدن، بـۆی دەرچـوون، تـێتـەقانـدن، پێپێوەنان ۞ دررفتن

**bunk beds** *noun, pl.*

تەختی دوونهۆم ۞ تختوخواب دوطبقه

**bunker** /ˈbʌŋkə(r)/ *noun*

1 خەڵـووزدان، عـەماری سـووتەمەنی یـان خەڵووز (لە کەشتیدا) 2 پەناگە (ژێرزەمینی)، شوێنی هەڵگرتن، عەمار، کۆگە 3 قوڵکە، چاڵ (بە زیخ پڕ کراوەتەوە، لە یاری گۆلفدا) 4 (میلیتاری) بـوودرێ تەقەمەنی ۞ 1 مخـزن 2 پناهگاه 3 گودال 4 زاغەی مهمات

**bunkhouse** /ˈbʌŋkhaʊs/ *noun*

خانووبەرەیێ بۆ کارکردن و خەوتن، جێخەوی کرێکاران ۞ ساختمان برای کارکردن یا خوابیدن

**bunkum** /ˈbʌŋkəm/ *noun*, also buncombe

هەڵیتوپلیت، حەلەقومەلەق، قسەی هیچەکە ۞ شر و ور، مزخرف

**bunny** /ˈbʌni/ *noun*, also bunny rabbit, *pl.* bunnies

1 (بە زمانی منـاڵان) کەرویشک، کەرڤیشک 2 (ئەوسترالیا) قوربانی، dupe ۞ 1 خرگـوش 2 قربانی، آدم سادەلوح

**bunny girl** *noun*

کچی کەرویشکی (ئامـاژە بەو خانەخوێیانەی شەوانە کە بەرگی وەکوو کەرویشکی لەبەر دایە) ۞ دختر خرگوشی

**bunny slope** = nursery slope

**bunsen burner** /ˌbʌnsn ˈbɜːnə(r), US ˈbɜːrn-/ *noun*, also Bunsen burner

چـرای بانسـێن (لە توێژینگاکـاندا؛ بنـەڕەت: لـە نـاوی کیمیـازانی ئـەڵـمانی Robert W. Bunsen) ۞ چراغ بونزن

**bunt**[1] /bʌnt/ *noun*

1 نیوەڕاسـتی داکـەوتووی تـۆڕی ماسـی 2 نیوەڕاسـتی بـادەوە ۞ 1 قـسـمت میـان تـور ماهیگیری 2 وسط بادبان

**bunt**[2] /bʌnt/ *noun*

نەخۆشی یان ئازارێکی کەڕوویی گەنم ۞ بانت

**buntal** /ˈbʌnt(ə)l/ *noun*

کـای talipot palm، بـۆ سـازکردنی کـڵاو بەکاردێنرێ ۞ بونتال

**bunting**[1] /ˈbʌntɪŋ/ *noun*

باڵندەیەکی چکۆلە، سەربە تیرەی سەیرە finch و چۆلەکـە sparrow، چەنـدین جۆریـان هەیـە و توخمـەکـانی تـر، خێـزان [Emberiza: Emberizidae] ۞ گەلی جۆرن] ۞ بانتینگ

**bunting**[2] /ˈbʌntɪŋ/ *noun*

ئالاکانی جوانی یان بۆ رازاندنەوە ۞ پرچمهای تزیینی

**bunya** /'bʌnjə/ *noun*, also bunya bunya /'bʌnjə,bʌnjə/
جـۆرێ داری درێـژی ئەوسـترالیایی، سـەربە monkey puzzle بەرێکی زلە دەگرێ کە دانی تیایە [*Araucaria bidwillii*] ۞ بونیا

**bunyip** /'bʌnjɪp/ *noun*
1 (ئەوسترالیا) دەعبایێکی ئەفسانەیی کە دەڵێن خێوی چۆم و ئاوەکانە 2 تەڵەکباز، دەسبڕ، فێڵەباز ۞ 1 بونیپ 2 شیاد

**buoy** /bɔɪ, US 'bu:i/ *noun*
لەنگەرە، بۆیە، تۆپەی سەراوکەوتە، تۆپەی (یان تۆپی) سواراو، خڕۆکەی سەراوکە ۞ گویـەی شناور

**buoyancy** /-ənsi/ *noun*, also buoyance
1 سـەراوکەوتوویی، سـەرکەوتەیی، مـەلـەونی، سـەراوکی، سـەراوکەیی، سـووکی، سـواراوی، توانایی سەراوکەوتەیی 2 بەکەیفی، خۆشحاڵی، بەگوڕی، دڵخۆشی، شادی ۞ 1 شناوری، قدرت شناوری 2 سرزندگی

**buoyant** /'bɔɪənt, US 'bu:jənt/ *adjective*
1 سـەرئاوکەوتە، سـواراو، سـووک، مـەلـەون، سەراوک، سـەرکەوتە، لـە سـەرەوە رایـدەگرێ، سـەرخەرە، سـەرئاوخەرە، سـەرەوەبەرە 2 شـاد، بەکەیف، بەگوڕ، گەشبین، بەرچاوڕوون 3 (بازار و ئـابووری) رووڵەسـەرێ، روو لـە زۆری ۞ 1 شناور 2 سرزنده، خوش‌بین 3 فزاینده

**buoyantly** /'bɔɪəntli, US 'bu:jəntli/ *adverb*
سـەرکەوتانە، بەشێوەیەکی سەراوکەوتە ۞ بـه طور شـناور

**bur** /'bɜ(r)/ *noun*
(رووەکناسی) پێکوڵ، درەسووچە، سێدانە ۞ خارخسک

**Burberry** /'bɜ:b(ə)ri/ *noun*, also burberry, *pl.* Burberries
(دروشمی بازرگانی) بارانی (سووک، کـوت، (*Burberrys Ltd* ۞ بارانی

**burble** /'bɜ:bl, US 'bɜ:rbl/ *noun*
سرتەسرت، سرتوهۆر، چرپوهۆر ۞ صـدای بچ‌بچ پیاپی

**burbot** /'bɜ:bət/ *noun*, *pl.* burbot or burbots
ماسیپەرێشنە (جۆرێ ماسی تەرکنشینی درێژ کە تەنیا ماسی ئاوی شیرینە لە تیرەی cod [*Lota lota*] ۞ ماهی ریش‌دار

**burbs** /bɜ:bz, US bɜ:rbz/ = suburbs

**burden** /'bɜ:dn, US 'bɜ:rdn/ *noun*
1 بـاری قـورس، گوشـار، قورسـایی، بـارگرانی، سەنگی: *the heavy tax burden on working people* 2 بار 3 بەرپرسایەتی (قورس)، ئەرک، پـەیور، duty، responsibility: *to bear/carry/ease/reduce/share the burden* ◊ *The main burden of caring for old people falls on the state* 4 توانایی هەڵگرتنی کەشتی، کەشتیبەرە، جێبوونەوە، توانایی 5 تێبینی یان بابەتی سەرەکی، بیرۆکەی سەرەکی یان بنەڕەتی 6 سەربەند ۞ 1 بار سنگین، فشار 2 محموله 3 مسؤلیت، وظیفه 4 ظرفیت 5 نکته یا موضوع اصلی، اندیشه‌ی اصلی 6 ترجیع

**burdened** *adjective*
لەژێرباری ۞ تحت فشار

**burden of proof** *noun*, the burden of proof lies with the accuser
(ماف) بەرپرسایەتی سەلماندنی راستی: *The burden of proof is on the prosecution* ۞ مسؤلیت اثبات ادعا

**burdensome** /'bɜ:dnsəm, US 'bɜ:rd-/ *adjective*
گرنگ، سەخت، ئاستەم قورس، دژوار، ناخۆش، بەتاڵووکە، پشتشکێن: *burdensome restrictions* ۞ مهم، خطیر، شاق

**burdock** /'bɜ:dɒk/ *noun*
(گەڵا)بناوەتۆم، هەوێدار، حەشەگیرە، حەچەگیرە، هەوێدار، جلگرە، گیای تیرە daisy و جۆرەکانی تر [*Arctium pubens*] ۞ اراقیطون، باباآدم

**bureau** /'bjʊərəʊ, US 'bjʊroʊ/ *noun*, *pl.* bureaux or bureaus
1 بەڕێوەبەری، کارگێری، فەرمانگە، رێقەبەری، ئاژانس، نووسینگە 2 مێزی نووسین (زۆرتر کەشەوێشی هەبێ) 3 دۆلابێ جل، دراوێر (فەرەنسی، مێزپۆش، لە *burel* فەرەنسی کۆن "کوتاڵی لەخوری"، لە *bure* فەرەنسی کۆن لە late Latin *burra* "کوتاڵ یان پارچەی زبر") ۞ 1 اداره، دفتر 2 میز تحریر 3 قفسه‌ی لباس

**bureaucracy** /bjʊə'rɒkrəsi, US bjʊ'rɑ:k-/ *noun*, *pl.* bureaucracies
1 بیرۆکراسی، دیوانکراسی، نووسینگەگێری، سیستەم یان دەزگای بەڕێوەبەری: 2 *unnecessary/excessive bureaucracy* ئەفسەرانی حکومەت، رایەدارێن رێقەبەری، کاربەدەستانی بەڕێوەبەرایەتی: *the power of the state bureaucracy* ◊ *living in a modern bureaucracy* 3 دابودەستووری رۆتینی لەرادەبەدەر، دابودەستووری ناپێویستی بەڕێوەبەرایەتی ۞ 1 دیوان‌سالاری، سیستم اداری 2 افسران دولت 3 تشریفات غیرضروری اداری

**bureaucrat** /'bjʊərəkræt, US 'bjʊr-/ *noun*
1 بیرۆکرات، دیوانکرات، نووسینگەگێر 2 فەرمانبەرێ توندگر یان وشک و سەختگر 3 کاربەدەست یان رایەداری بەڕێوەبەری ۞ 1 دیوان‌سالار 2 کارمند مقرراتی 3 مقام اداری

**bureaucratic** /ˌbjʊərə'krætɪk, US ˌbjʊr-/

**camisole** /ˈkæmɪsəʊl, US -soʊl/ *noun*
کامیسۆل (= جۆریّ بنکراسیی ژنانەیە) ۞ کامیسول

**camomile** *noun*, also chamomile
بیبوون، بەیبوون، قرمیچە؟، گولەچەرمگە، گورالەچەمینانە، گولەسپی، شێروشەپال، گولەحاجییانە، گولەچاویشە، گولەفەقێ ۞ بابونه

**camouflage** /ˈkæməflɑːʒ/ *noun*
خۆمەلاسدان، خۆماتدان، رەنگگۆڕین، خۆداپۆشین، خۆدەرهێنان، خۆشاردنەوە، خۆحەشاردان (بە شێوەی سروشت) ۞ استتار

**camouflaged** *adjective*
خۆمەلاسداو، خۆماتکردوو، رەنگگرتوو، خۆداپۆشیو، خۆوەشاردوو، نادیار، شاراوە، داپۆشراو، داپێچراو، حەشاردراو ۞ استتارشده، نهفته

**camp**[1] /kæmp/ *noun*
1 وارگە، چادرگا، کەمپ، هۆبە، زۆم، بارەگا، هەوارگە، لەشکرگا: *2 to pitch/make camp* ریباز، گروپ، دەستە، حیزب 3 خێوەت، چادر 4 (هەروەها summer camp) بەرنامەی پشووی هاوینی بۆ منالان (کە کۆمەلێ چالاکی تیا دەنوێنرێ) 5 (بریتانیا، شوێنەوارناسی) شوێنێکی دەورگیراوی پێشمێژوو 6 (ئەفریکای باشووری) شوێنێکی دەورگیراو یان کێلگەیێکی پەرژینکراو بۆ لەوەڕاندن 7 (ئەوسترالیا و نیوزیلەند) شوێنێ کە ئاژەل و پاتالی لێ زۆرجار کۆدەکرێتەوە 8 جۆرێ کایەی کۆنی تۆپێن 9 ململانێی شەڕ، ژیان یان سیرقیی لەشکری، ژیانی سەربازی 10 = day camp (بنەڕەت: لە *campus* لاتین "زەوی تەخت") ۞ 1 اردوگاه، اردو 2 مسلک، گروه، حزب 3 چادر 4، 5، 6 و 7 کامپ 8 نوعی بازی فوتبال قدیمی 9 کشمکش جنگ، زندگی یا سرویس نظامی

**camp**[2] /kæmp/ *adjective*
پێکەنینی، گالتەجاڕ ۞ مسخره

**campaign** /kæmˈpeɪn/ *noun*
1 زنجیرە کردارێکی شەڕی، کردار (شەڕ) 2 هێرش، پەلامار 3 شالاو، هەلمەت، خەبات، چالاکی 4 ستراتیژی ۞ 1 عملیات 2 حمله 3 پیکار، مبارزه، فعالیت 4 استراتژی

**campaigner** /kæmˈpeɪnə(r)/ *noun*
خەباتگێڕ، خەباتکار، هەلمەتکار، شالاوکار ۞ مبارز

**campaigning** *noun*
شالاو، هەلمەت، خەبات ۞ مبارزه، پیکار

**campaniform** *adjective*
گەڕنالئاسا، شێوەزەنگ، زەنگی، زەنگناسا ۞ ناقوس‌مانند

**campanile** /ˌkæmpəˈniːli/ *noun*
(ئیتالیایی) زەنگ، گەڕنال، ژام ۞ ناقوس

**campanological** *adjective*
سەربە زەنگژەنی ۞ وابستە بە ناقوس‌نوازی

**campanologist** /-ədʒɪst/ *noun*
زەنگژەن، زەنگلێدەر، زەنگکوت ۞ ناقوس‌نواز

**campanology** /ˌkæmpəˈnɒlədʒi, US -ˈnɑːl-/ *noun*
زەنگلێدان، زەنگژەنی، هونەری زەنگلێدان ۞ ناقوس‌نوازی

**campanula** /kamˈpanjʊlə/ *noun*, also bellflower
(رووەکناسی) گولەزەنگە، گولەپیالە، زەنگەلە (بنەڕەت: لاتینی نوێ، چکۆلێنراوی *campana* late Latin "زەنگ bell") ۞ گل استکانی

**campanulate** /kamˈpanjʊlət/ *adjective*
(گولێ) زەنگئاسا، زەنگی، شێوەزەنگ: *campanulate flowers* ۞ زنگ‌مانند

**camp bed** *noun*
تەختی قەدکراو یا دانووشتاو، تەختی کۆوەبوو (خەو) ۞ تخت تاشو

**Campbellite** *noun*
یەکێ لە تیرەکانی دیانی کە بە ناوی شاگردانی کریست Disciples of Christ ناویان دەرکردووە (لە ناوی Alexander Campbell) ۞ کامبلیت

**camp-chair** *noun*
کورسی قەدکراو، سەندەلی دانووشتاو یان سەفەری ۞ صندلی تاشو

**camper** /ˈkæmpə(r)/ *noun*
کەمپنشین، نیشتەجێ یان دانیشتووی کەمپ ۞ ساکن اردو

**campestral** *adjective*
1 دەشتەکی، دەشتی 2 کێلگەیی ۞ 1 صحرایی 2 وابستە بە کشتزار

**camp fire** *noun*
ئاگری کەمپ ۞ آتش اردوگاه

**Camp Fire girl** *noun*
کچێکی ئەندامی ڕێکخراوەیێکی نیشتمانی لاوان لە تەمەنی 5 تا 18 سالان ۞ کامپ فایر گیرل

**camp girl** *noun*
ئەندامی ڕێکخراوەی نیشتمانی کچان ۞ کامپ‌گرل

**camp follower** *noun*
1 لایەنگر 2 خۆیێ‌هەلواسیو، کلک 3 (لە کەمپی سەربازیدا) دەسگێڕ، دەسفرۆش ۞ 1 هوادار 2 طفیلی 3 پیله‌ور

**campground** /ˈkæmpgraʊnd/ = campsite

**camphor** /ˈkæmfə(r)/ *noun*
کامفێر، کافوور: ناوێتە یان ماکێکی کریستالی زووهەلمیوی سپی $C_{10}H_{16}O$، بە بۆنی خۆش و مەزەی تالەوە، لە هێندێ ڕۆنی عەتردا هەیە،

ب.ت. له دار و تویکلی داری کافوور دهگیرێ ◌ کافور

**camphoraceous** /ˌkæmfəˈreɪʃəs/ *adjective*
کافووراوی، کافووری، کافووردار ◌ کافوری

**camphorated** *adjective*
کافووراوی، کافووردار ◌ کافورزده

**camphoric** *adjective*
کافووری ◌ کافوری

**camphor oil** *noun*
رۆنی کافوور ◌ روغن کافور

**camphor tree** *noun*
دارکافوور [*Cinnamomum camphora*] ◌ درخت کافور

**campimetry** /kamˈpɪmətri/ *noun*
شێوەی بۆ پێوانی مەودای بینایی چاو ◌ کامپیمتری

**camping** /ˈkæmpɪŋ/ *noun*
له چادردا ژیان (ڕۆژانی پشوو) ◌ کامپینگ

**camping site** = campsite

**campion** /ˈkampɪən/ *noun*, also catchfly
مێشەگیرە، چەورۆکە، کامپیۆن: جۆرێ گیاکێوی گوڵدار، له تیرەی Pink [تۆخمەکانی *Silene* و *Lychnis*] ◌ سیلن، مگس‌گیر

**camp meeting** *noun*
کۆبوونەوەی ئایینی (له کەش وهەوایێکی ئازادا) ◌ گردهمایی مذهبی

**campo** /ˈkampəʊ/ *noun*, *pl.* campos
مەیدان (- له شارێکی سپانیا یان ئیتالیادا) ◌ میدان

**campo santo** *noun*
قەبرستان، قەبران ◌ گورستان

**campsite** /ˈkæmpsaɪt/ *noun*, also ˈcamping site or ˈcamp·ground
خێوەتگەی پشوودەرەکان یان بنکەی خێوەتهەڵدانی کاتی ◌ اردوگاه توریستی

**campstool** *noun*
چوارپایە یا چوارپێچکەی قەدکراو، کورسی دانووشتاو ◌ عسلی تاشو

**campus** /ˈkæmpəs/ *noun*, *adjective*, *pl.* campuses
*n* 1 دەوروبەری زانکۆ 2 خانووبەرە و زەوی زانکۆ یان کۆلێژ، زانکۆوبەرە 3 زانکۆ، لق (زانکۆ) 4 دەوروبەری کۆلێژ، خوێندنگا، نەخۆشخانە یان دەزگایێکی تر *adj* زانکۆیی ◌ *n* 1 محوطه‌ی دانشگاه 2 دانشگاه 3 شعبه 4 محوطه *adj* دانشگاهی

**campylobacter** /ˈkampɪləʊˌbaktə, ˌkampɪləʊˈbaktə/ *noun*
چەماوەبەکتریا: جۆرێ بەکتریای میلەئاسای تۆخمی کە بەرپرسە بۆ بەرخستنی ئاژەڵ abortion و ژاراویبوونی خۆراکی مرۆڤەکان [تۆخم *Campylobacter*] (بنەڕەت: لە *kampulos* یۆنانی "چەماو") ◌ نوعی باکتری

**campylotropous** *adjective*
خاوەنی هێلکۆکەیێکی چەماو ◌ دارای تخمک خمیده

**camshaft** /ˈkæmʃɑːft, US -ʃæft/ *noun*
(میکانیک) میل‌کۆپار(ە، )کامشافت، کەمشافت ◌ میل بادامک

**camwood** *noun*
سوورەداری سەختی درەختی padauk ی ئەفریکایی ◌ نوعی درخت

**Can.** *abbreviation* Canada or Canadian

**can** /kæn/ *noun*
1 قوتو، تەنەکە، پووتی، چەلەنگ، پیپ 2 زیندان، بەندیخانە 3 دەس‌بەئاو 4 (cans) هێدفۆن ◌ 1 قوطی، حلب 2 هلفدونی 3 توالت 4 (در جمع) هدفون

**Canaanite** /ˈkeɪnənʌɪt/ *noun*, *adjective*
1 ئەندامی گەلێکی سامی، دانیشتووی فەلەستین و فینیکیەی کۆن دەوروبەری 3000 ساڵ بەرلە زایین 2 کەنعانی ◌ کنعانی

**Canada balsam** *noun*
جۆرێ جەوکی زەردباو کە لە سنەوبەری باڵسام دەگیرێ، لە بواری مایکرۆسکۆپی‌دا بەکاردێنرێ ◌ بالسام کانادا

**Canada French** *noun*
زمانی فەرەنسی باو لە کەنەدا ◌ فرانسوی کانادایی

**Canada goose** *noun*
قازی کەنەدی [*Branta canadensis*] ◌ نوعی غاز

**Canada parrot feather** *noun*
کیوار، کیفار، کیفار، کیمار ◌ کنگر هرز، کنگر صحرایی

**Canadian** /kəˈneɪdiən/ *adjective*, *noun*
*adj* کەنەدی، کانادایی، سەربە کەنەدی *n* خەڵکی کەنەدی، کانادایی، دانیشتووی کانادا ◌ *adj* کانادایی *n* اهل کانادا

**Canadian footbal** *noun*
تۆپێن یان فوتبۆلی کەنەدی ◌ فوتبال کانادایی

**Canadien** /ˌkanaˈdjũ, French kanadjɛ̃/ *noun*, *adjective*, also -nadian
(کەسێکی) کەنەدی فەرەنسی ◌ (شخص) کانادایی فرانسوی

**canaille** /kaˈnʌɪ, French kanaj/ *noun*
(سووکانە) خەڵکی ڕەمەکی، سەگەڵ(وگورگ) ◌ مردم عادی

**canal** /kəˈnæl/ *noun*
1 ئاوەرێ، ئاودر، ئاودرکە، نۆکەنەد، کەنداو، درناڵ، درگە، ڕەهەنداو، کاریز: *the Panama/Suez Canal* 2 زێ، چۆمەڵ، جۆ، جۆگە: *an irrigation canal* 3 (ڕووەکناسی

و تویکاری) جۆگە، لوولە (، بڕوانە alimentary canal؛ بنەڕەت: لە فەڕەنسی کۆنەوە، گۆڕاوی chanel "channel"، لە canalis لاتین "لوولە، شوێن، کەند، کووز، کاناڵ"، لە canna "لەوەن، قامیش، canc") ◌ 1 کانال، آبراه، ترعه 2 نهر 3 مجرا

**canal boat** *noun*

بەلەم یان گەمی باریک، گەمییەباریکە ◌ قایق کانالی

**canalization** /ˌkænəlaɪˈzeɪʃn, US -nələˈz-/ *noun*

1 کانالیزە کردن، بەڕێدابردن، بەرەهەندابردن، نۆکەندکێشان، جۆگەلێدان، رەهەنداوکێشی 2 تۆڕی رەهەنداو یان ئاوەڕۆکان، جۆگەڕاکێشان ◌ 1 کانالیزاسیون، ترعەسازی 2 شبکەی کانالها

**canapé** /ˈkænəpeɪ, US ˌkænəˈpeɪ/ *noun*

بابۆڵەی تێکەڵ (گۆشت، ماسی، پەنیر و هتد، لەگەڵ خواردنەوە ب.ت. لە میوانی، لە فەڕەنسییەوە) ◌ کاناپی

**canard** /kæˈnɑːd, kænɑːd, US kəˈnɑːrd, ˈkænɑːrd/ *noun*

بەندوباو، واتەوات، قەلۆک، ترەهات، ئەفسانە، نەزیلە، دەنگۆ، بەندوبالۆرە، درۆودەلەسە ◌ شایعه، ترهات، اکاذیب

**Canarese** = Kanarese

**canary** /kəˈneəri, US -ˈneri/ *noun, pl.* canaries

1 بلبلی زەرد، بلبلەزەردە، قەناری، کاناری [*Serinus canaria* (دوورگەکانی کاناری، Azores و Madeira) و جۆرە پێوەندیدارەکانی لە ئەفریکادا] 2 (هەروەها canary yellow) رەنگی زەردی رۆشن یان کاڵ 3 مەی سەربە دوورگەکانی کاناری 4 گۆرانیبێژی ژن 5 هەڵپەڕکێی کۆنی فەڕەنسی ◌ 1 قناری 2 زرد قناری 3 شراب کاناری 4 خوانندەی زن 5 رقص قدیمی فرانسه

**canary creeper** *noun*

(رووەکناسی) گیایێکی هەڵچووی ئەمریکای باشووری، گوڵی زەردی گەش دێتێ [*Tropaeolium peregrinum*] ◌ نوعی گیاه

**canary grass** *noun*

(رووەکناسی) گیاکاناری: گیایێکی درێژی باکووری رۆژاوای ئەفریکا و دوورگەکانی کاناری، دانەکەی دەدرێ با باڵندەی ناو قەفەز [توخم *Phalaris*: چەندین جۆرن] ◌ نوعی گیاه

**canasta** /kəˈnæstə/ *noun*

(فەڕەنسی) کێنەستا (یارییێ بە پەڕ کە لە rummy دەچێ) ◌ کاناستا

**cancan** /ˈkænkæn/ *noun*

کەنکەن (= جۆرێ هەڵپەڕکێ یان سەمای توند و کرژی ژنان، لە بنەڕەت فەڕەنسی)، سێجرتەکێ ◌ کنکن

**cancelbot** /ˈkansəlbɒt/ *noun*

بەرنامەیێ بۆ گەڕان و لابردنی پەیامە ئیمەیلییەکان ◌ کانسلبوت

**cancellate** /ˈkænsəleɪt/ *adjective,* also cancellated /ˈkænsəleɪtɪd/ or cancellous /ˈkans(ə)ləs/

1 (تویکاری) کونکون، داببێژدابێژ، تۆڕی، ئیسفەنجی (وەک کۆتایی ئێسکە درێژەکان) 2 = reticulate ◌ سوراخسوراخ

**cancellous bone** *noun*

ئێسکی کونکون یان ئیسفەنجی ◌ استخوان اسفنجی یا سوراخسوراخ

**cancellation** /ˌkænsəˈleɪʃn/ *noun,* also cancelation

1 پووچ کردنەوە، بەتاڵ کردنەوە، هەڵوەشێنراوی، هەڵوەشاندن، هەڵوەشیان، پووچەڵ کردنەوە 2 شتی پووچەوەکراو، پووچەک 3 مۆری پووچەڵ کردنەوە 4 لابردن ◌ 1 لغو، الغا، ابطال 2 باطلی 3 مهر ابطال 4 حذف

**cancer** /ˈkænsə(r)/ *noun*

1 شێرپەنجە، قرژانگ، قرژاڵە: *lung/breast cancer* ◊ *cancer research* 2 بەلای گشتی، بەلا، پەتا، سەرەتان، تەوەرە، کارەسات، تەڵەزگە: *Violence is a cancer in our society* ◌ 1 سرطان 2 غدەی سرطانی، مصیبت

**Cancer** /ˈkænsə(r)/ *noun*

1 قرژاڵ، قرژانگ (چوارەمین کەلوو لە زۆدیاک) 2 گەلەستێرەی قرژاڵ ◌ 1 سرطان 2 صورت فلکی سرطان

**cancered** *adjective*

شێرپەنجەگرتوو، شێرپەنجەدار، سەرەتانگرتوو، سەرەتانپیاکراو، تووشی شێرپەنجەبوو ◌ دچار سرطان

**Cancerian** /-ˈsɪəriən, US -ˈseːriən/ *adjective*

سەربە کەلووی قرژاڵ یان گەلەستێرەی قرژاڵ ◌ وابسته به برج سرطان یا صورت فلکی سرطان

**canceroid** /ˈkæŋkrɔɪd/ *adjective*

شێرپەنجەئاسا، شێوەقرژانگ ◌ سرطانمانند

**cancerous** /ˈkænsərəs/ *adjective*

شێرپەنجەیی، شێرپەنجەگرتوو: *cancerous cells/growths* ◌ سرطانی

**cancer stick** *noun*

(نافەرمی و بە شۆخی) دارە شێرپەنجە، سیگار ◌ کانسر استیک، سیگار

**candela** /kænˈdelə, US -ˈdiːlə, ˈkændɪlə/ *noun*

مۆمە، کاندێلا ( یەکەی جیهانی پێوانی تیژی رووناکی) ◌ کاندلا

**candelabra** /ˌkændəˈlɑːbrə/ *noun*

شەمدان، مۆمدان ◌ شمعدان

**candelabra tree** *noun*
دارەشەمدانی، دارەمۆمدانی: شێوەمۆمدان [توخم *Araucaria* و *Euphorbia* (ئەفریکا) *angustifolia* (ئەمریکای باشووری)] ◌ نوعی درخت

**candelabrum** /ˌkændəˈlɑːbrəm/ *noun, pl.* candelabra /-brə/
شەمدان، مۆمدان، چلچرا ◌ شمعدان

**candent** *adjective*
کلپەکردوو، کلپن، درەوشاوە، رووناک ◌ متوهج

**candescence** *noun*
کلپەکردن، درەوشانەوە ◌ توهج

**candescent** *adjective*
کلپەکردوو، کلپن، درەوشاوە ◌ متوهج

**candid** /ˈkændɪd/ *adjective*
1 قسەلەڕوو، بێلەڕوودامان، بێقەلەودەلە، بێ‌گرێ و قۆرت، بێ‌شێلەوێلە، پاک‌وباراشی، ڕێک‌وڕاست 2 لانەگرانە، واقع‌بین 3 (وێنە یان فیلم) شاراوە، نادیار ( candidly /ˈkændɪdli/ *adv*: پاک‌وباراشی، بێ‌فروفێل، ڕێک‌وڕاست) ◌ 1 رک، صاف و پوست‌کنده 2 منصفانه 3 مخفی

**candida** /ˈkandɪdə/ *noun*
سپیکە (= جۆرێ کەڕوو fungus ی مشەخۆر، کە جاروبار دەبێتە هۆی نەخۆشی بۆقزە thrush [توخم *Candida*]؛ candidal *adj*) ◌ کاندیدا

**candidacy** /ˈkændɪdəsi/ *noun,* also candidature /ˈkændɪdətʃə(r)/
پالێوراوی، بەرئەندامی، بەربژاری، ناولێنراوی: *to announce/declare/withdraw your candidacy for the post* ◌ نامزدی

**candidate** /ˈkændɪdət, US -deɪt/ *noun*
1 پالێوراو، بەرئەندام، بەربژار، ناولێنراو: *a candidate for governor* 2 شتێکی گونجاو یان باش ◌ 1 نامزد 2 مورد مناسب

**candidiasis** /ˌkandɪˈdʌɪəsɪs/ *noun, pl.* candidiases, also moniliasis
نەخۆش‌کەوتن بە سپیکە ◌ کاندیدیاسیس

**candidness** /ˈkændɪdnəs/ *noun*
قسەلەڕوویی، بێلەڕوودامان ◌ رگ‌گویی

**candied** /ˈkændid/ *adjective*
شەکرپێوەکراو: *candied fruit*, *candied peel* (= of oranges) ◌ شکرزده

**candiru** /ˌkandɪˈruː/ *noun*
جۆرێ ماسی ناوچەی ئامازۆن [ *Vandellia cirrhosa*] (بنەڕەت: لە *candirú* تووپییەوە (Tupi ◌ کاندیرو

**candle** /ˈkændl/ *noun*
شەم، مۆم: *a flickering candle* (بنەڕەت: *candel* ئینگلیسی کۆن، لە *candela* لاتین، لە *candere* "سپی‌بوونەوە، ورشەهاتن، درەوشانەوە") ◌ شمع

**candlefish** *noun, pl.* same or candlefishes
ماسی‌یەمۆمە (هی دەریا و ورد و خۆراکی، کەناری رۆژاوای ئەمریکای باکووری [*Thaleichthys pacificus*]) ◌ نوعی ماهی

**candlelight** /ˈkændllaɪt/ *noun*
شەوقی مۆم، رۆشنایی شەم ◌ نور شمع

**candlelit** /ˈkændllɪt/ *adjective*
لەبەر شەوقی شەمدا، رۆشن لەبەر مۆمدا ◌ با نور شمع روشن‌شده

**candle-maker** /ˈkændlmeɪkə(r)/ *noun*
مۆمساز، مۆمگەر، وەستای مۆم ◌ شمع‌ساز

**Candlemas** /ˈkand(ə)lmas, US -məs/ *noun*
فێستیڤاڵێکی کریستانیەتە، لە دووەمی فێبریویری دەگیرێ ◌ کاندلمس

**candlenut** *noun*
ناوکەمۆمە، دارەمۆمە: دارێکی سەوزەونی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا و دورگەکانی پاسیفیکی باشووری [*Aleurites moluccana*] ◌ کاندل‌نات

**candlepower** *noun*
هێزی شەم، مۆمهێز (یەکەی تیژی رووناکی) ◌ شمع

**candlestick** /ˈkændlstɪk/ *noun*
شەمدان، مۆمدان، جێ‌مۆم ◌ شمعدان

**candlewick** /ˈkændlwɪk/ *noun, adjective*
1 پلیتە 2 خاولەیی (وەکوو بەرگەتەختی خەو و هتد) ◌ 1 فتیله 2 حوله‌ای

**candomblé** /ˌkandɒmˈbleɪ/ *noun*
دەستەیێکی دینی لە تیرەی macumba ◌ کاندامبلی

**candour** /ˈkændə(r)/ *noun,* US candor
1 قسەلەڕوویی، سەرڕاستی، راست‌رۆیشتوویی 2 لانەگری، بەدادی ◌ 1 صداقت، صراحت 2 انصاف

**C & W** *abbreviation* country and western

**candy** /ˈkændi/ *noun, pl.* candies
1 نەباتاو، نەبات، شیرینی، نوقڵ 2 چاکلێت، شوکولات: ◊ *a candy store* ◊ *box of candy* ◊ *a candy bar* ◌ 1 آب‌نبات، نبات، شیرینی 2 شکلات

**candy apple** = toffee apple

**candy-floss** /ˈkændiflɒs, US -flɔːs, -flɑːs/ *noun,* US candy cotton
پەشمەک ◌ پشمک

**candyman** /ˈkændimæn/ *noun, pl.* candymen
بەنگ‌فرۆش، کەسێ کە دەرمانی ناقانوونی دەفرۆشێ ◌ کندی‌من

**candy-striped** *adjective*
کەندی‌ستریپت، پارچەی ریزریزی سپی چیرەیی

شعرای یمانی 2 وابسته به چله‌ی تابستان

**canid** /ˈkanɪd/ *noun*
(گیانه‌وه‌رناسی) شیرده‌رێ له‌ تیره‌ی سه‌گ (Canidae)، گورگه‌کان، چه‌قه‌له‌کان jackals، کۆیۆتی‌یه‌کان coyotes، ریوی و سه‌گه (خۆ)ماڵی‌یه‌کان ده‌گریته‌وه ◌ پستانداری از سگ‌سانان

**Canidae** *noun, pl.*
سه‌گان، له‌ خێزانی سه‌گ، تیره‌سه‌گ ◌ سگ‌سانان

**canine** /ˈkeɪnaɪn/ *adjective, noun*
*adj* له‌سه‌گ‌چوو، شێوه‌سه‌گ، سه‌گسار، سه‌گ‌تیره، سه‌گی، سه‌ربه سه‌گ *n* 1 ددانی پێشه‌وه، که‌ڵبه، که‌ڵبه (بروانه incisor و molar) 2 سه‌گ، گه‌ماڵ، به‌شدار (له فه‌ره‌نسه‌وه، له لاتین، له caninus canis ـه‌وه "سه‌گ") ◌ *adj* شبیه سگ، وابسته به سگ *n* 1 دندان نیش 2 سگ

**canine tooth** *noun*
ددانی پێشه‌وه، که‌ڵبه، به‌رازه، دڕۆک ◌ دندان نیش

**Canis** /ˈkeɪnɪs/ *noun*
تیره‌ی سه‌گ ◌ جنس سگ یا کلب

**Canis Major** *noun*
(ئه‌ستێره‌وانی) گه‌وره‌سه‌گ، سه‌گی گه‌وره‌تر (the Great Dog، کۆئه‌ستێره‌یێ که Sirius تیایه) ◌ کلب اکبر

**Canis Minor** *noun*
(ئه‌ستێره‌وانی) چووکه‌سه‌گ، سه‌گۆکه، سه‌گی بچووک‌تر (the Little or Lesser Dog، کۆئه‌ستێره‌یێ که Procyon تیایه) ◌ کلب صغیر

**canister** /ˈkænɪstə(r)/ *noun*
1 قوتو، که‌نیستێر، پرژێنه، قوتوچایی، چارێز 2 قرتاڵه یان سه‌وه‌ته‌ی حه‌سیری 3 جۆرێ گوڵله تۆپی نزیک‌هاوێژ ◌ 1 قوطی، افشانه، قوطی چایی 2 سبد حصیری 3 کانیستر

**canities** *noun*
سپی‌بوونی موو ◌ سفید شدن مو

**canker** /ˈkæŋkə(r)/ *noun*
1 برین (لێو، ده‌م و هتد)، تامیسک، تێمیسک، خشرۆک 2 خوره، میتێل، ئافه‌ت (دار) 3 لاره‌شه، سندان 4 به‌لا، کاریگه‌ری خراپ، ناسۆر، په‌تا، سه‌ره‌تان ◌ 1 زخم، آکله، تبخال 2 آفت 3 قانقاریا 4 مصیبت، بلای عمومی

**cankerous** *adjective*
1 تێمیسک‌ده‌رکردوو، تامیسکاوی 2 لاره‌شه‌دار، سنداناوی، لاره‌شه‌گرتوو، سندان‌گرتوو ◌ 1 تبخال‌دار 2 قانقرایایی

**canker sore** *noun*
برین (لێو، ده‌م و هتد)، تێمیسک، تامیسک، خشرۆک ◌ زخم، تبخال

**cankerworm** *noun*
کرمی داری به‌پووله‌شه‌وگه‌ڕێکی ئه‌مریکای

◌ کندی‌استریپت

**candy-striper** *noun*
نه‌خۆش‌یاری خۆبه‌خش (ژن و له نه‌خۆش‌خانه‌دا) ◌ پرستار داوطلب

**candytuft** *noun*
گیایێ به سه‌لکه‌گوڵی سپی، په‌مه‌یی یان ئه‌رخه‌وانی چکۆلانه‌وه [توخم *Iberis*] (بنه‌ڕه‌ت: گۆڕاوی *Candia* "ناوی پێشووی Crete" + tuft) ◌ نوعی گیاه

**cane** /keɪn/ *noun, adjective*
*n* 1 له‌وه‌ن، قامیش، چیت، ژاژ، نه‌ی، نه‌یجه 2 حه‌سیر: *a cane chair* 3 گۆچان، دارده‌ست: *He clutched a top hat and a silver-topped cane* 4 توول، شوول، دار، خامه، شوولک 5 قامیشی شه‌کر 6 دار یا شوولکی ته‌مێ (خوێندنگای ماڵه‌وه) *adj* حه‌سیری ◌ *n* 1 نی 2 حصیر 3 عصا، چوب‌دستی 4 ترکه، چوب 5 نی‌شکر 6 تنبیه (چوب) *adj* حصیری

**cane-brake** *noun*
قامیشه‌لان، چیته‌لان، له‌وه‌ن‌جاڕ ◌ نی‌زار

**caned** *adjective*
(بریتانیا و نافه‌رمی) مه‌ست (به ئاره‌ق یان شتی تر) ◌ مست

**cane rat** *noun,* also cutting grass or grasscutter
گیابڕه: مشکێ له‌وه‌ن یان قامیش [توخم *Thryonomys*] ◌ نوعی موش

**canescent** *adjective*
سپی مه‌یله‌و مات، ته‌ڵخ، لێڵ: *canescent leaves* ◌ کدر

**cane sugar** *noun*
قه‌ند یان شه‌کری قامیشی شه‌کر sugarcane ◌ قند نی‌شکر

**cane toad** *noun*, also giant toad
بۆقی قامیش(ـه‌ڵـ)ان: قاوه‌یی زله‌ی گه‌رمێنانی ئه‌مریکا، له‌ هێندێ شوێن‌دا بۆ مه‌هاری pest ده‌ناسێنرێ [*Bufo marinus*] ◌ نوعی وزغ

**Canfield** *noun,* also Canfield
کانفیلد: جۆرێ کایه‌ی solitaire، زۆرتر بۆ قومار ده‌کرێ (بنه‌ڕه‌ت: له ناوی قوماربازی ئه‌مریکایی *Canfield* .Richard A (-1855 1914)) ◌ کانفیلد

**cangue** *noun*
کانگ: ته‌خته‌یێکی قورس، تاوانکارانی له‌ چین پێ ده‌به‌ستراوه ◌ کانگ

**Canicula** *noun*
(ئه‌ستێره‌وانی) کاروان‌کوژه، گه‌لاوێژ، کانکیولا (= Sirius) ◌ شعرای یمانی

**canicular** /kəˈnɪkjʊlə(r)/ *adjective*
1 (ئه‌ستێره‌وانی) سه‌ربه کانکیولا 2 سه‌ربه یان پێوه‌ندی به چله‌ی هاوینه‌وه هه‌یه ◌ 1 وابسته به

باکووری کە خونچە یان گەڵای داز دەخوا، هەریەک لە دوو پەپوولەشەوگەڕی geometrid *Paleacrita* و *Alsophila pometaria* [*vernata*] ۞ نوعی کرم

**canna** /'kanə/ *noun*
گیایێکی زەمبەقیناسای گەرمێنانی ئەمریکا، بە گوڵی گەش و گەڵای قایشئاسای جوانییەوە [توخم *Canna*: چەندین جۆرن] ۞ کانا

**cannabin** *noun*
کانابین (ڕیزین (جەوک)ێکی ژاراوی لە گیابەنگ دەگیرێ) ۞ کانابین

**cannabinol** /'kanəbɪˌnɒl, kə'nab-/ *noun*
(کیمیا) جۆرێ ناوێتەی کریستاڵی $C_{21}H_{26}O_2$ کە بەرهەمەکانی ب.ت. THC پێکهێنەرێکی چالاکی cannabis ـن ۞ کانابینول

**cannabis** /'kænəbɪs/ *noun*
گیابەنگ، حەشیشە، مەریوانە، گوڵەلێوە، بۆ بەرهەمهێنانی ریشاڵی گوش یان شادانە بەکاردێنرێ [*Cannabis sativa*] ۞ حشیش، ماریجوانا

**canned** /kænd/ *adjective*
1 (لە)قوتوکراو 2 جێبەجێکراو 3 تۆمارکراو 4 مەست، کەلەلا، کەیل ۞ 1 کنسروشدە 2 اجراشدە 3 ضبطشدە 4 مست

**cannel coal** /'kan(ə)l/ *noun*
جۆرە خەڵووزێکی قیراوی سەخت و چڕ ۞ نوعی زغالسنگ

**cannelloni** /ˌkænə'ləʊni, US -'loʊni/ *noun, pl.*
کەنیلۆنی (جۆرێ چێشت) ۞ کانلونی

**cannelure** /'kan(ə)ljʊə/ *noun*
کەند یان شوێنی دەوری بەشی لوولەکی تیر یان گوولە ۞ کانلور

**cannery** /'kænəri/ *noun, pl.* canneries
کارگە یان کارخانەی (لە) قوتوکردن ۞ کارخانەی کنسروسازی

**cannibal** /'kænɪbl/ *noun, adjective*
1 پیاوخۆر، مرۆخۆر، خۆخۆر 2 هاوڕەگەزخۆر، هاوجۆرخۆر: گیانەوەرێ کە گۆشتی هاوجۆری دەخوا ۞ 1 آدمخوار 2 همجنسخوار

**cannibalism** /'kænɪbəlɪzəm/ *noun*
1 پیاوخۆری، مرۆخۆری، خۆخۆری 2 هاوڕەگەزخۆری، هاوجۆرخۆر ۞ 1 آدمخواری 2 همجنسخواری

**cannibalistic** /ˌkænɪbə'lɪstɪk/ *adjective*
سەربە cannibalism، خۆخۆرییانە ۞ وابستە بە آدمخواری یا همنوعخواری

**cannibalization** /ˌkænɪbəlaɪ'zeɪʃn, US -lə'z-/ *noun*
تەوراقکاری، لێکهەڵوەشاندن، پارچەپارچەکردن (دەرهێنانی چەند پارچەیێ لە دەزگا یان ماشێنێ و خستنەسەر دەزگا یان ماشێنێکی تر) ۞ اوراقسازی

**cannikin** /ˌkænəkn/ *noun*
قوتوی (تەنەکەی) چکۆلانە، ئاوخۆری، ئایەرە یان پێوانەی چکۆلانە ۞ ظرف کوچک، آبخوری، پیمانەی کوچک

**cannily** /'kænɪli/ *adverb*
زیرەکانە، زرینگانە، بە زیرەکی ۞ با زرنگی

**canniness** /'kæninəs/ *noun*
ئاگاداری، هۆشیاری، زیرەکی، زرنگی، وریایی ۞ احتیاط، زرنگی

**canning** *noun*
قوتوکردن، کردنەقوتو ۞ کنسروسازی

**cannon** /'kænən/ *noun, pl.* cannons or cannon
1 تۆپ (هی شەڕ)، شەستیری فڕۆکە 2 لوولەک 3 (لە بیلیاردا) لێککەوتنی دوو تۆپ 4 ئێسکی لوولاک (بنەڕەت: لە *canon* فەرەنسی، لە *cannone* ئیتالیایی "لوولەی گەورە"، لە *canna* "لەوەن، قامیش cane، reed") ۞ 1 توپ، مسلسل هواپیما 2 استوانە 3 کانون 4 استخوان ساق پا

**cannonade** /ˌkænə'neɪd/ *noun*
تۆپباران ۞ گلولەباران

**cannonball** /'kænənbɔːl/ *noun*
گوللەتۆپ ۞ گلولەی توپ

**cannon-bone** *noun*
ئێسکی لوولاک ۞ استخوان ساقپا

**cannoneer** /ˌkænənɪ(r)/ *noun*
تۆپهاوێژ، تۆپچی، تۆپخەر ۞ توپانداز

**cannonery** *noun*
تۆپهاوێژی، تۆپچێتی، تۆپخەری ۞ توپاندازی

**cannon fodder** *noun*
خۆراکی تۆپ (یان شەڕ)، سەربازانی بەر تۆپ ۞ گوشت دم توپ

**cannot** /'kænɒt, US -nɑːt/ = can not

**cannula** /'kanjʊlə/ *noun, pl.* cannulae /-liː/ or cannulas
(نەشتەرگەری) لوولە، میل، لەوانژە، لەوانچە (بنەڕەت: لە لاتینەوە "لەوەنی چکۆلە small reed"، چکۆلێنراوی *canna* (بڕوانە cane) ۞ لولە، سوند

**cannulate** /'kænjulɪt, -leɪt/ *adjective,* also -ted /'kænjulɪtɪd, -leɪtɪd/
لوولەیی، ناوچۆڵ: *cannulated the femoral artery* ۞ لولەای

**cannulation** *noun*
لوولەدانان، میلدانان، لەوانژەتێخستن ۞ لولەگذاری، سوندگذاری

**canny** /'kæni/ *adjective* (cannier, canniest)
بەمشوور، دووربین، زیرەک، وریا، زرنگ،

وشیار، دەسپیوەگر : *a ◊ a canny politician*
زیرک، ⟐ *a canny lawyer ◊ canny move*
ناقلا، مقتصد

**canola** /kəˈnəʊlə/ *noun*
جۆرێ شەلەمی رۆنی کە لە ئەمریکای باکووری شین دەبێ ⟐ کانولا

**canoe** /kəˈnuː/ *noun*
بەلەم، گەمی، لۆتکە (بنەڕەت: لە *canaoua* کارائیبی) ⟐ قایق، بلم

**canoe shell** *noun*
لەپکەبەلەمی: جۆرێ لەش نەرمی دەریایی کە قاوخێکی ناسکی هەیە، بە کوتێکی پانەوە [خێزان Scaphandridae] ⟐ نوعی نرم‌تن

**canoeing** /kəˈnuːɪŋ/ *noun*
گەمی‌سواری، گەمی‌یەوانی، گەمی‌ئاژۆیی، گەمی‌لێخوڕی: *to go canoeing* ⟐ بلم‌رانی

**canoeist** /kəˈnuːɪst/ *noun*
گەمی‌سوار، گەمی‌یەوان، گەمی‌لێخوڕ، گەمی‌ئاژۆ ⟐ بلم‌ران

**can of worms** = Pandora's box

**canola** /kəˈnəʊlə/ *noun*
شەلەمەرۆنەی جۆرێ کە لە ئەمریکا دەروێنرێ (بنەڕەت: لە *Canada* + *-ola* (لەسەر بنچینەی *oleum* لاتین "رۆن") ⟐ کانولا

**canon** /ˈkænən/ *noun*
1 قانوون، زاگۆن، زاکوون، ریسا، بنەڕەت، بنەما، بنچینە 2 قانوونی کلیسە یان شەرع 3 قەشە (ئەندامی کلیسەی کاتیدراڵ) 4 قانوونی کلیسە یان شەرع 5 کتێبە رەسەن یان قانوونی‌یەکان (ئەو کتێبانەی کەوا لە لایەن کلیسەوە پەسند کراون) 6 پێودانگ، پێوەر، کێشانە، پێوانە 7 شوێنەوار یان نووسراوە باوەڕپێکراو یان رەسەنەکان (هی نووسەرێ) 8 (canons) داب و نەریت 9 (موسیقا) کانون (بنەڕەت: ئینگلیسی کۆن، لە لاتینەوە، لە *kanōn* یونانی‌یەوە "rule") ⟐ 1 قانون، اصل، قاعده 2 قانون شرع 3 کشیش 4 قانون کلیسا 5 کتاب‌های اصیل یا قانونی 6 معیار، سنجه 7 آثار معتبر 8 (در جمع) آداب و رسوم 9 (موسیقی) کانُن

**cañon** = archaic spelling of canyon

**canoness** *noun*
ژنێ کە لە کۆمەڵەیێکی دینی (کریستانیەت)دا دەژی بەڵام سوێندخواردە یان پەیمان‌بەستەی ئەوێ نییە؛ ئەندامی هێندێ دەستە و تیرەی کلیسەی کاتۆلیکی رۆم کە ژیانێکی وەک رەبەنەکانیان هەیە ⟐ کانونس

**canonic** /kəˈnɒnɪk/ *adjective*
canonical = 2 (موسیقا) بە شێوەی کانۆنی 1 ⟐ کانونیک

**canonical** /kəˈnɒnɪkl, US -ˈnɑːn-/ *adjective*
1 شەرعی، قانوونی، زاگۆنی 2 رەوا، رەسەن، باو، پەسندکراو، ستاندارد 3 قەشەیی، سەربە قەشە 4 بەپێی قانوونی کلیسە، بەگوێرەی قانوونی کلیسە 5 (canonicals /kəˈnɒnɪklz/) کانۆنیکاڵز (ئەو جلوبەرگەی کە قەشە بەدرێژایی ئاهەنگی کلیسە لەبەری دەکا) ⟐ 1 قانونی 2 مشروع، اصیل، مرسوم 3 وابسته به کشیش 4 مطابق قانون کلیسا 5 کانونیکالز

**canonical hour** *noun*
1 کاتی دوعا و نوێژ، وەختی دوعاونزا؛ کات‌وساتی خواپەرستی کە matins لەگەڵ lauds، prime، tierce (یان terce)، sext، nones، vespers و compline دەگرێتەوە 2 (لە کلیسەی ئینگلتەرەدا) کاتی زەماوەند بە شێوەی قانوونی (زۆرتر نێوان 8 بەیانی و 6 ئێواری) ⟐ 1 وقت دعا و نماز، کانونیکال اور 2 کانونیکال اور

**canonically** /kəˈnɒnɪkli, US -ˈnɑːn-/ *adverb*
بە شێوەیێکی شەرعی یا قانوونی، لە رێگای قانوونەوە ⟐ به طور قانونی

**canonicity** /ˌkænəˈnɪsəti/ *noun*
رەوایی‌بوون، رەوایێتی، بەپێی قانوونی کلیسا ⟐ مطابقت با قانون شرع

**canonist** /ˈkænənɪst/ *noun*
زانای قانوونی کلیسا، قانوون‌زانی کلیسە ⟐ عالم به قانون کلیسایی

**canonization** /ˌkænənaɪˈzeɪʃn, US -nəˈz-/ *noun*
1 راگەیاندنی بوونە saint بەشێوەیەکی فەرمی، راگەیاندنی فەرمی‌یانەی بوونە سەینت 2 رەوایی‌پێدان ⟐ 1 مقدس‌سازی 2 مشروع‌سازی

**canon law** *noun*
قانوون یان زاگۆنی کلیسا، یاسای کلیسە (ی کریستانیەت) ⟐ فقه

**canon regular** *noun*
ئەندامی هەریەک لە کۆمەڵە یان تیرەی قەشەکانی کاتۆلیکی رۆم، ئەندامی هێندێ تیرەگەلی دینی religious order کلیسەی کاتۆلیکی رۆم Roman Catholic ⟐ عضو هریک از انجمن‌های کشیشان کاتولیک روم

**canonry** *noun, pl.* canonries
دادگای کلیسە یان شەرع، ئافیسی کلیسە ⟐ دادگاه شرع

**can opener** = tin-opener

**Canopic jar** /kəˈnəʊpɪk/ *noun*
کووپە یان خوڵەمێش‌دانێ لە میسری کۆن کە هەناوی مردوویان بە مۆمیاکراوی تیادەنا (بنەڕەت: *Canopic* لە *Canopicus* لاتین، لە *Canopus* ـەوە "شارێکی میسری کۆن") ⟐ کانوپیک جار

**canopied** *adjective*
چەتردار، چەترێ هەیە ⟐ دارای سایبان

**Canopus** /kəˈnəʊpəs/ *noun*, Latin, from

Greek *Kanōpos*
1 (ئەستێرەوانی) پرگ، سیوەیل 2 ئەرابەوانی Menelaus لە میسر مرد و بووە ئەستێرەی پرگ یان کانۆپۆس (بنەرەت: میتۆلۆژی یۆنانی، لە *Canopicus* لاتینەوە، لە *Canopus*، شارێکی میسری کۆن) ◌ 1 سهیل 2 کانوپوس
**canopy** /'kænəpi/ *noun, pl.* canopies
1 چەتر، سێبەری سەر، ئاسمانە، ژوورسەر، کانۆپی، دەرپیچەی ژوورسەری فڕۆکەوان 2 گومەز، گومبەز، قوبە ◌ 1 سایبان، کانوپی 2 گنبد
**canorous** /kə'nɔːrəs/ *adjective*
زر(ی)نگاوە، زولال، خۆش‌ئاواز، دەنگ‌خۆش، موسیقایی، ئاوازین، canorously ( melodious *adv*، -orousness *n* ) ◌ طنین‌انداز، خوش‌آهنگ
**cant** /kænt/ *noun, adjective*
*n* 1 هیپۆکریسی، ریاییبازی، خۆبەراست‌زانی، رووبینی، دوورووی (ب.ت. لە بواری ئایینیدا) 2 زمانی تایبەتی (یان کۆمەڵێکی تایبەتی) 3 جوولانەوەی کتوپڕ، تەکان، راتڵەکان، راچڵەکان 4 لاری، خواری، تەلان، لاپێ، گۆشەی دەرەوە 5 خستن یان تووڕهەڵدانی ناکاو *adj* خێچ، لار، خوار، لێژ ◌ *n* 1 زهدفروشی 2 زبان خاص 3 حرکت ناگهانی 4 انحنا، شیب، کجی، زاویەی خارجی 5 پرتاب ناگهانی *adj* کج، اریب
**can't** = cannot
**Cantab** /'kæntæb/ *abbreviation* cantabrigiensis
سەربە زانکۆی کەمبریج ◌ وابسته به دانشگاه کمبریج
**Cantabrigian** /ˌkantə'brɪdʒɪən/ *adjective, noun*
*adj* سەربە کەمبریج یان زانکۆی کەمبریج *n* ئەندامی زانکۆی کەمبریج ◌ *adj* وابسته به کمبریج یا دانشگاه کمبریج *n* عضو دانشگاه کمبریج
**cantal** /'kantɑːl/ *noun*
پەنیرێکی توند و رەق، پتر لە Auvergne دەکرێ ◌ کانتال
**cantaloupe** /'kantəluːp/ *noun,* also cantaloup
[*Cucumis melo reticulatus*] گرکە، گەرمک (لە *cantaloupe* فەرەنسەوە، لە *Cantaluppi* نزیک رۆم) ◌ طالبی
**cantankerous** /kæn'tæŋkərəs/ *adjective*
1 خوێنتاڵ، رەزاگران، رووتاڵ، دژخوو، رووگرژ، مرومۆچ، نەمرچ، بەزەرە 2 جینگزی، زووتووڕە، فیشەکی، شەڕانی ◌ 1 بدخلق 2 دعوایی
**cantankerously** /kæn'tæŋkərəsli/ *adverb*
بە رووتاڵییەوە، بە مرومۆچییەوە، بە رووگرژییەوە ◌ با بدخلقی
**cantankerousness** /kæn'tæŋkərəsnəs/ *noun*
1 خوێنتاڵی، رەزاگرانی، رووتاڵی، رووگرژی، مرومۆچی، نەمرچی 2 جینگزیتی، زووتووڕەیی، شەڕانیتی ◌ 1 بدخلقی 2 دعوایی بودن
**cantata** /kæn'tɑːtə/ *noun*
کەنتاتا: پارچە موسیقایێ ب.ت. لەمەڕ دینەوە ◌ کانتاتا
**cantatrice** /ˌkɑːtɑːt'riːtʃe/ *noun*
(فەرەنسی) گۆرانیبێژ، سترانبێژ (ژن) ◌ آوازەخوان (زن)
**canteen** /kæn'tiːn/ *noun*
1 چێشت‌خۆری، سێلف‌سێرڤیس (خوێندنگا، کارگا، نووسینگە و هتد) 2 قومقومە، مەتارە (سەربازان) 3 سندووق، سێرڤیس، قوتوو (قاپ‌وکەوچک) ◌ 1 غذاخوری، سرویس 2 قمقمه 3 جعبه
**canter** /'kæntə(r)/ *noun*
چوارناڵەی هێواش، نەرمەغار، وێرغە (توندتر لە tort و سووکتر لە gallop) ◌ تاخت
**Canterbury bell** *noun*
گوڵەزەنگەیێکی درێژی داچێنراو، کە گوڵی گەورەی شینی کاڵ دەکا [*Campanula medium*] ◌ نوعی گیاه
**cantharus** /'kanθ(ə)rəs/ *noun, pl.* canthari
(لە رۆم یان یۆنانی کۆندا) جامی خواردنەوەی دووقوڵفە ◌ کانتاروس
**canthic** *adjective*
قنچکی، سەربە کانتوس canthus ◌ وابسته به کانتوس
**cant hook** *noun*
قولاپی کۆلکە (بۆ تلارکردنەوە یان گرتن) ◌ کانت هوک
**canthus** /'kanθəs/ *noun, pl.* canthi /-θʌɪ/
قنچک، گۆشەی دەرەوە یان نێوەوەی چاو، جێیێ کە پێلووی سەروو و خواروو یەک دەگرنەوە (بنەرەت: لە لاتین، لە *kanthos* یۆنانی) ◌ کانتوس
**canticle** /'kæntɪkl/ *noun*
سرودی ئایینی یان دینی ◌ سرود مذهبی
**cantilever** /'kæntɪliːvə(r)/ *noun*
ستوون یان کۆڵەکەی سەرئازاد (یەکسەری ئازادە) ◌ تیر طرەای
**cantilever bridge** *noun*
پردی کۆڵەکەی سەرئازاد، پردی قۆڵی یان قۆڵ‌قۆڵ ◌ پل طرەای
**cantillation** *noun*
وتن بە گۆرانی، خوێندنەوە بە ئاواز ◌ با آواز خواندن
**cantina** /kan'tiːnə/ *noun*
(لە سپانیایی و ئیتالیاییەوە) 1 (لە ناوچە سپانیاییزمانەکاندا) مەیخانە 2 (لە ئیتالیا)

دووکانی مەی ۞ کانتینا

**cantle** /ˈkant(ə)l/ *noun*
1 قاش، پشک، کەرت، پارچە، پار، پاژ، part، portion 2 پاشکۆ، (ئەسپ) 3 گۆشە، سووچ ۞ 1 تکە 2 کانتل 3 گوشە

**canto** /ˈkæntəʊ, US -toʊ/ *noun, pl.* cantos
کۆپلە، برگە، بەشەهەڵبەست، بڕک، کەرت ۞ بند

**canton** /ˈkæntɒn, US -tən, -tɑːn/ *noun*
1 /ˈkantɒn, kanˈtɒn/ ژێربەشێکی بەڕێوەبەرییانە یان سیاسی وڵاتێ؛ کانتۆن، هەرێم (ب.ت. هی کۆنفیدراسیۆنی سویسرا (یان سویس) 2 (بێباو obsolete) بەش، پار، کەرت، پارچە 3 /ˈkant(ə)n/ (heraldry) نیشانەیێکی چوارگۆشە چکۆلەتر لە چارەکەیێ quarter، لە گۆشەی ژووروویی (زۆرتر لای ڕاست dexter) مەتالێ shield دادەنرێ؛ شێوەیێکی چوارگۆشەیی لە سووچی ئالا، بە نیشانە یان بەرژەنگی نیشتمانی (یان نەتەوەیی) یەوە؛ شوێنی سەرەکی لای ڕاستی field یکی heraldic 4 بەشێ لە arrondissement ی فەڕەنسی ۞ 1 کانتو، ایالت 2 جزء 3 و 4 کانتون

**cantonal** /ˈkantən(ə)l, US kanˈtəʊn(ə)l/ *adjective*
سەربە کانتۆن، هەرێمی ۞ کانتو، ایالت

**Cantonese** /ˌkæntəˈniːz/ *noun, adjective*
*n* 1 کانتۆنیز (شێوەیەکی ئاخافتنی چینییەکان لە باشووری چین و هۆنگ‌کۆنگ‌دا) 2 ڕەسەن یان دانیشتووی کانتۆن (Guangzhou)، شارێ لە چین *adj* سەربە کانتۆن یان کانتۆنییەکان ۞ کانتونیز

**cantonment** /kænˈtɒnmənt, -ˈtuːn-, US kænˈtɑːn-/ *noun*
1 سەربازگە 2 کەمپی لەشکری هەمیشەیی، هۆبەی لەشکری (ب.ت. هیندوستان) ۞ 1 پادگان 2 اردوگاه نظامی

**cantor** /ˈkæntɔː(r)/ *noun*
کانتۆر، سەردەستە یان ڕێبەری دەستەی سرودبێژەکان (کەنیسە یان کلیسە)، precentor (بنەڕەت: لە لاتین canere، لە "گۆرانیبێژ"، "گۆرانی وتن") ۞ کانتور

**cantorial** *adjective*
1 سەربە cantor 2 سەربە لای سەرووی کۆرێ لە کلیسە، جێگایێ کانتۆرەکان لەوێ دادەنیشن ۞ کانتوریال

**cantrip** /ˈkantrɪp/ *noun*
(سکاتلەند) گزە، فێڵ، کەڵەک، تەڵەکە، فڕوفێڵ، trick ۞ کلک، حقه، حیله

**cantus** /ˈkantəs/ *noun*
کانتوس (بەرزترین دەنگ لە موسیقای کۆری چەنددەنگە) ۞ کانتوس

**Cantuck** /kəˈnʌk/ *noun*
(ئافەرمی) کەسێکی کەنەدی، ب.ت. کەنەدییێکی فەڕەنسی ۞ کانتوک

**canula** /ˈkænjələ/ *noun*
میلۆچکە، میلچە ۞ میل کوچک

**canvas** /ˈkænvəs/ *noun, pl.* canvases or canvasses
1 ڕۆنی وێنەکێشی، وێنەکێشی پەردە، پارچە یان لەتە جاوێ بۆ لەسەر کێشانەوە 2 باگەر، بادەوە، چارۆکە، کۆبادەوە، کۆمەڵە چارۆکەی کەشتی 3 جاو، کانڤاس، چادر، برێزێنت ۞ 1 روغن نقاشی، نقاشی روی بوم 2 بادبان، مجموعەی بادبان‌های کشتی 3 کرباس، چادر، برزنت

**canvasback** *noun*
مراوییێکی مەلەوانی ئەمریکای باکووری، پێوەندی بە pochard ەوە هەیە [*Aythya valisineria*] ۞ کانواس‌بک

**canvass** /ˈkænvəs/ *noun*
1 ڕاگەیاندن: *to carry out a canvass* 2 بوارڕەخسان، گلاڵەبوون، بۆ هەڵکەوتن 3 ڕاپرسی ۞ 1 تبلیغ 2 زمینه‌یابی 3 نظرخواهی

**canvasser** *noun*
1 ڕاگەیەنەر 2 بوارڕەخسێن ۞ 1 مبلغ 2 زمینه‌یاب

**canvassing** *noun*
1 ڕاگەیاندن 2 بوارڕەخسان ۞ 1 تبلیغ 2 زمینه‌یابی

**cany** *adjective*
قامیشەلان، پڕقامیش، پڕنەی، پڕچیت، چیتەلان ۞ نی‌زار

**canyon** /ˈkænjən/ *noun*
دۆڵاو، خەڵەند، تەنگژە، دەربەند، کانیۆن (ب.ت. قووڵ و ڕووباریشی پیابڕوا، بنەڕەت: لە *canon* سپانیایی "tube"، لەسەر بنچینەی *canna* لاتین "cane reed") ۞ کانیون

**canyoneer** *noun*
کانیۆنیر، کانیۆنینگ‌کار، کانیۆنینگ‌باز ۞ کانیونیر

**canyoning** /ˈkænjənɪŋ/ *noun,* us canyoneering
کانیۆنینگ (جۆرێ وەرزش) ۞ کانیونینگ

**canzone** /kanˈtsəʊneɪ, US -z-/ *noun, pl.* canzoni /-ni/
1 جۆرێ لیریک، شێوەی madrigal دەدا 2 گۆرانی یا ballad ئیتالیایی یان پرۆڤێنسال ۞ کانیونینگ

**canzonet** *noun*
گۆرانی یان سرودی (بەزمی یان بەجۆش) ۞ آواز یا سرود

**caoutchouc** /ˈkaʊtʃʊk/ *noun*
جیر، لاستیک (هی سروشتی و نافۆلکانیزێنراو) ۞ لاستیک

**CAP** /ˌsiː eɪ ˈpiː/ *abbreviation* Common Agricultural Policy

(یەکێتی ئەوروپا) سی‌ئەی‌پی: رامیاری یان سیاسەتی هاوبەشی کشتوکالی، کاپ ◌ سی‌ئەی‌پی: سیاست مشترک کشاورزی، کاپ

**cap** /kæp/ *noun*

1 کلاو، جۆری کلاو بە visor یان بێ brim، شەپکە، تەقیلە، تەپلە، کلاوی شانازی یان زانکۆیی (بڕوانە mortar board) 2 دەزگا، دیافراگم (ژنان) 3 سەر، درگا، کلاوە، قەپاخ، سەرپۆش، سەرقاپ: *a bottle cap*، *a lens cap* 4 تۆقتۆقە؛ = percussion cap 5 کلاوە: بەشی سەرووی تەختی fruiting body ی کارگ یان toadstool 6 کلاوە: تاج یان رووپۆشی دەسکرد بۆ ددانێ 7 زۆرترین، زۆرینە، ئەوپەڕ، هەرەسەروو، دوایین رادە، ceiling (وەک خەرج و بار): *The government has placed a cap on local council spending* 8 نیشانەی ∩، ئاماژە بە هاوبڕی intersection دوو کۆمەلە یان دەستە 9 (زۆرتر لە بریتانیا) جۆری کلاو کە دەبەخشرێتە ئەندامانی تیپێکی وەرزشی، ب.ت. تیپێکی نیشتمانی 10 هێشووە گەردیٚ molecule یان دەستە مەتریالێکی کیمیایی کە بەستراونەتەوە بە سەرێک یان ناوچەیێ لە خانە، ڤایرۆس یان گەردیٚ ◌ 1 کلاه، شب‌کلاه، کلاه افتخار 2 دستگاه 3 در، درپوش 4 ترقه، چاشنی 5 کلاهک 6 کاپ 7 سقف، بیشینه 8، 9 و 10 کاپ

**cap.** *abbreviation* 1 capacity 2 capital (city) 3 capital letter

**capability** /ˌkeɪpəˈbɪləti/ *noun, pl.* capabilities

توانایی، توانست، خورتی، لێهاتوویی، لێوەشاوەیی، شیان، تواناداری، هێز: *beyond the capabilities of current technology* ◌ قابلیت، شایستگی، استعداد، قدرت

**capable** /ˈkeɪpəbl/ *adjective*

بەتوانا، توانا، توانادار، خورت، لێهاتوو، ژیهاتی، لێوەشاو، بەکارهاتوو، بەرژەوەند، شیاو، بەشیان، susceptible: *a remark capable of being misunderstood* ◊ (بێباو) = comprehensive: *concentration is capable of intense* ◌ قابل، مستعد، شایسته، صلاحیت‌دار

**capably** /ˈkeɪpəbli/ *adverb*

بە لێهاتوویی‌یەوە، لێوەشاوانە، لێهاتووانە: *He managed the conference very apably* ◌ با قابلیت

**capacious** /kəˈpeɪʃəs/ *adjective*

جێدار، گەورە، هەراو، وەراق، فراوان، زل، بەرفرە، roomy: *capacious pockets* (capaciously *adv*؛ capaciousness *n*: جێداری، گەورەیی، هەراوی، فراوانی، جێ‌گرتن، جێ‌بوونەوە) ◌ فراخ، جادار

**capacitance** /kəˈpasɪt(ə)ns/ *noun*

(فیزیک) بارگەگری، توانایی سیستمێ بۆ هەلگرتنی بارگەی ئێلیکتریکی ( capacitive *adj*؛ capacitively *adv*) ◌ کاپاسیتانس

**capacitation** *noun*

شیاندن، لێوەشاوکردن، (بە)تواناکردن، توانایی‌پێدان ◌ لایق کردن، صلاحیت‌دار کردن

**capacitor** /kəˈpæsɪtə(r)/ *noun*

بارگەگر، چرەک: دەزگایێ بۆ هەلگرتنەوەی بارگەی ئێلیکتریکی، لە یەک یان چەند جووت گەیێنەر conductor کە بەهۆی ئینسولاتۆرێکەوە insulator لێک جیا کراونەتەوە ◌ خازن

**capacity** /kəˈpæsəti/ *noun, pl.* capacities

1 جێ‌بوونەوە، گرتن، هەلگرتن، بردن، گونجایشت، جێگا، جێ، فراوانی: *a fuel tank with a capacity of 50 litres* 2 هێز، وزە، توانایی، توانین، توانست، خورتی، لێوەشاوەیی، لێهاتوویی، شیان، تواناداری: *intellectual capacity* 3 پۆست، پلەوپایە 4 تێگەیشتن 5 = capacitance ◌ 1 گنجایش، ظرفیت 2 قدرت، لیاقت، شایستگی، قابلیت، امکان 3 مقام 4 درک

**cap-a-pie** /ˌkæp ə ˈpiː/ *adverb*

سەرتاپێ، سەرتاسەر، لە سەرەوە تا نووکی پێ، لە تەوقەسەرەوە تا نووکی پێ: *armed cap-a-pie for battle* ◌ سرتاپا

**caparison** /kəˈpærɪs(ə)n/ *noun*

کەلوپەلی ئەسپ، شێل، سەرجل، شەقەبەند، زین و بەرگ، زرێ، رەخت‌وشەقەبەند، زین و رەخت، زینپۆش، سەرزین، رەختی ئەسپ ◌ لوازم اسب، برگستوان، شنل اسب، زین و برگ

**cape**[1] /keɪp/ *noun*

کۆلوانە، چارەکە، چارۆکە، تەرگە ◌ شنل

**cape**[2] /keɪp/ *noun*

1 پێشکۆ، لووتکە، سەرک، کەپک، باریکان 2 (the Cape) کەیپ یان لووتکە یان باریکانی هیوانی باش Good Hope 3 (the Cape) هەرێمی کەیپی جارانی ئەفریکای باشووری ◌ 1 دماغه 2 دماغه‌ی امید نیک 3 کیپ

**Cape Cod cottage** *noun*

کۆختەیێکی لاکێشەیی یەک یان یەک و نیو نهۆم، بە بانی شیروانی زۆر لێژەوە ◌ نوعی کلبه

**Cape Coloured** *noun*

دوورەگە، دورِزە، دوورەگەی ستان یان هەرێمی کەیپ (لە ئەفریکای باشووری) ◌ دورگه، دورگه‌ی استان کیپ

**caped** /keɪpt/ *adjective*

کۆلوانەلەبەر، چارۆکەلەبەر، تەرگەبەشان، کۆلوانەپۆش ◌ شنل‌پوشیده

**Cape doctor** *noun*

(ئەفریکای باشووری، نافەرمی) بایێکی زاڵ و توندی باشووری رۆژهەلات لە هەرێمی کەیپی

ڕۆژاوا ◌ نوعی باد

**Cape Dutch** *noun*
(مێژوویی) شێوەیێکی هولەندی کە لە لایەن دانیشتووانی سەرەتای لووتکەی هیوای باش قسەی پێدەکرا، لە نێو ئەفریکانێرەکاندا پەرەی سەند ◌ کیپ داچ

**Cape gooseberry** *noun*
1 بەرێکی خۆراکی نەرم و زەرد 2 جۆرێ ڕووەکی گەرمێنانی ئەمریکای باشووری کە ئەم بەرە دەگرێ [*Physalis peruviana*] ◌ کیپ گوسبری

**Cape hen** *noun*
جۆرێ petrelی ئۆقیانووسە باشووریەکان، زۆرتر بە پەڕوباڵی ڕەش یان قاوەیی [*Procellaria aequinoctialis*] ◌ نوعی پرنده

**Cape jasmine** *noun*
جۆرێ gardeniaی بۆنخۆشی چینی، گوڵەکانی بۆ چایی بۆنخۆش بەکاردێترێ [*Gardenia jasminioides*] ◌ نوعی یاسمن

**capelin** /ˈkeɪplɪn, US ˈkap-/ *noun*, also caplin
جۆرێ ماسی چکۆلەی ئاوە کەنارییەکانی ئەتلانتیکی باکووری، گرنگە لەبەر گۆشتەکەی [*Mallotus villosus*] ◌ نوعی ماهی

**capeline** *noun*
تاس کڵاوی چکۆلانە، کڵاوخودی چکۆلانە ◌ کلاه‌خود کوچک

**Capella** /kəˈpelə/ *noun*
بزنەوان، کاپێلا: ئەستێرەیێکی magnitudeی یەکەم لە Auriga ◌ عیوق

**capellini** /ˌkapeˈliːniː/ *noun, pl.*
(ئیتالیایی) جۆرێ پاستای زۆر باریک یان مووی ◌ کاپلینی

**Cape Malay** *noun*, also Cape Muslim
(لە ئەفریکای باشووریدا) ئەندامی کۆمەڵێکی مسوڵمانی زۆربە ئەفریکانسزمانی دانیشتووی هەرێمی کەیپی ڕۆژاوا ◌ کیپ مالای

**Cape primrose** = streptocarpus

**caper**[1] /ˈkeɪpə(r)/ *noun*
(ڕووەکناسی) شێفەلەتە، مەرگمار، گیرۆک، مارگیر، کەبەر، کەمەر، تەڵەمار [*Capparis spinosa*] ◌ کَبَر

**caper**[2] /ˈkeɪpə(r)/ *noun*
1 هەڵبەزودابەز، هەڵبەزکێ، بەزمورەزم 2 چالاکی ناقانوونی و پڕمەترسی: *He's involved in some sort of organized crime caper* ◌ 1 جست‌وخیز 2 فعالیت غیرقانونی یا خطرناک

**capercaillie** /ˌkapəˈkeɪli/ *noun*, Scottish also capercailzie /-ˈkeɪlzi/, *pl.* capercaillies
ئەسپی دارستان، جۆرێ کوڕکوڕەی قەڵئاسای turkey-like گازستانی باکووری ئەورووپا [*Tetrao urogallus*] ◌ نوعی باقرقره

**caper spurge** *noun*
(ڕووەکناسی) مراوکەمارگیرە، مراوکەکەبەرە: جۆرێ مراوکەی ئەورووپایی [*Euphorbia lathyris*] ◌ نوعی ماذریون

**capeskin** *noun*
چەرمێکی نەرم (لە پێستەی مەڕ یان بزن) ◌ نوعی پوست

**Capetian** /kəˈpiːʃ(ə)n/ *adjective, noun*
*adj* سەربە بەرەی دەسەڵاتداری فەرەنسی (987-1328) *n* ئەندامێکی ئەو بەرەیە (لە ناوی Hugh Capet دامەزرێنەری ئەو بەرەیە) ◌ کاپتین

**Cape Verdean** /ˈvəːdɪən/ *noun, adjective*
1 خەڵکی دوورگەکانی Cape Verde، ڕۆژاواترین شوێنی ئەفریکا 2 سەربە دوورگەکانی کەیپ ڤێردێ ◌ کیپ وردیان

**capful** /ˈkæpfʊl/ *noun, pl.* capfuls
پڕکڵاوێ، کڵاوێ ◌ به اندازه‌ی یک کلاه

**capias** /ˈkeɪpɪəs, US ˈkap-/ *noun, pl.* capiases
(ماف) دەستوور یان بڕیاری گرتنی کەسێکی دیاریکراو ◌ کاپیاس

**capillaceous** /ˌkæpəˈleɪʃəs/ *adjective*
دەزوولەیی، دەزووئاسا، مووئاسایی، موویێتی ◌ خاصیت مویی

**capillarity** /ˌkæpəˈlerətɪ/ *noun*
دەزوولەیی، موویێتی، دەزوویێتی، موولوولێتی ◌ مویێگی

**capillary** /kəˈpɪləri, US ˈkæpəleri/ *noun, adjective*
*n* موورەگ، دەزوورەگ، ڕەهێک، موولوولە، ڕەگەمووینە، دەزوولە *adj* 1 سەربە موویێتی، دەزوویێتی یان موورەگەکان 2 مووین ◌ *n* مویرگ، شعریه، مویین *adj* 1 وابسته به مویێگی یا مویرگ 2 مویین

**capillary action** *noun*, also capillarity
جووڵان یا کردەوەی موولوولەیی ◌ جنبش مویین

**capillary attraction** *noun*
ڕاکێشانی دەزوولەیی ◌ کشش مویین

**capital** /ˈkæpɪtl/ *noun, adjective*
*n* 1 پێتەخت، پایەتەخت، پاتەخت، شانشین 2 نێوەند، ناوەند، چەق 3 پیتی گەورە یان درشت 4 سەرمایە، دەسمایە، بنەپیت، مایە 5 سەرەستوون، تانج، سەرکۆڵ، ئەسپەرە، کۆتەڵە، سەرکۆڵەکە (1 کەژاوە: دوو کۆڵەکە لە (نێوەڕاستی) جەمسەری دیوار و دەستەکێکیش بە سەریدا ڕایەڵ دەکرا تا لە نێوەڕاستەوە قورسایی مێچەکە مەهار کا 2 خەسارە: ئەو دەستەکەی کە دەخرایە سەر دیوار تا کاریتە بچێتە سەری و قورسایی لەسەر دیوارەکە کەم کاتەوە، هەروەها حەماڵ) 6

باشـکەوت *adj* 1 شـیاوی مـەرگ یـان لەسـیدارەدان 2 بنـەڕەتی، سـەرەکی، بنچینـەیی، بنگـەهی، گرنـگ 3 یـەکجارباش، بـەرز 4 (پیـت) گەورە، درشـت، گردەک ⬡ *n* 1 پایتخت 2 مرکـز 3 حرف بزرگ 4 سرمایه 5 سرستون 6 ذخیره *adj* 1 مستوجب اعدام 2 اساسی، عمده، مهم 3 عـالی 4 (حروف) بزرگ

**capital asset** *noun*
دارایی سەرمایەیی ⬡ دارایی سرمایه‌ای

**capital budget** *noun*
دراونامە یـان بودجـەی سـەرمایەیی ⬡ بودجـەی سرمایه‌ای

**capital consumption** *noun*
لەکارکردن یا چواندن یا مەسـرەفی سـەرمایەیی ⬡ مصرف سرمایه‌ای

**capital creation** *noun*
سـەرمایە پێکـەوەنان، پێکـەوەنانی سـەرمایە ⬡ ایجاد سرمایه‌ای

**capital expenditure** *noun*
تێچـوون یـان خـەرجوبـاری سـەرمایەیی ⬡ هرینه‌های سرمایه‌ای

**capital expense** *noun*
تێچـوون یـان خـەرجوبـاری سـەرمایەیی ⬡ هزینه‌های سرمایه‌ای

**capital flight** *noun*
فڕینی سـەرمایە، دەرچـوونی سـەرمایە ⬡ فـرار سرمایه

**capital formation** *noun*
سـەرمایە پێکـەوەنان، پێکهێنـانی سـەرمایە ⬡ تشکیل سرمایه

**capital gain** *noun*
قازانجی سەرمایەنانەوە یا وەبەرهێنـان، زۆربـوونی بەها یان نرخی سەرمایە ⬡ سود سرمایه‌گذاری

**capital gain tax** *noun*
باجی قـازانجی سـەرمایەنانەوە یـان وەبەرهێنـان، باجی چوونەسـەرێی نرخـی سـەرمایە ⬡ مالیـات سود سرمایه‌گذاری

**capital goods** *noun, pl.*
کەلوپەلی سەرمایەیی ⬡ کالاهای سرمایه‌ای

**capital-intensive** *adjective*
سەرمایەهەڵلوش، سەرمایەویـست، سـەرمایەگر، سەرمایەهەڵگر، (سەر)مایەبەر ⬡ سرمایه‌بر

**capitalism** /ˈkæpɪtəlɪzəm/ *noun*
(سیستم) سەرمایەداری ⬡ سرمایه‌داری

**capitalist** /ˈkæpɪtəlɪst/ *noun, adjective*
*n* سـەرمایەدار، لایـەنگری سـەرمایەداری *adj* سـەربە سـەرمایەداری ⬡ *n* سـرمایه‌دار، طرفـدار سرمایه‌داری *adj* وابسته به سرمایه‌داری

**capitalistic** /ˌkæpɪtəˈlɪstɪk/ *adjective*
سەربە سەرمایەداری ⬡ وابسته به سرمایه‌داری

**capitalistically** /ˌkæpɪtəˈlɪstɪk(ə)li/ *adverb*
لەباری سەرمایەداری(یەوە) ⬡ از لحاظ سرمایه‌داری

**capitalization** /ˌkæpɪtəlaɪˈzeɪʃn, US -ləˈz-/ *noun*
1 سـەرمایەنانەوە، سـەرمایە پێکـەوەنان، کردنـە سـەرمایە، وەبـەرهێنان 2 بـەکارهێنـانی پیتـە گەورەکان، تایپ و نووسین یـان چاپکردن (ی وشـە یـان پیتـی letter) بـە پیتـە گـەورەکـان، دەسپێکردن (ی وشەیێ) بە پیتی گەورە ⬡ 1 سـرمایه‌گـذاری 2 اسـتفاده از حـروف بـزرگ، کاپیتالیزاسیون

**capital levy** *noun*
مایانە، سـەرمایانە، باجی سـەرمایە ⬡ مالیـات بـر سرمایه

**capital market** *noun*
بازاڕی سـەرمایە ⬡ بازار سرمایه

**capital punishment** *noun*
سزای مەرگ یان لە سێدارەدان ⬡ مجازات اعدام

**capital recovery** *noun*
دەسخـستنەوە یـان گێڕانـەوەی سـەرمایە ⬡ استرداد سرمایه

**capital ship** *noun*
کەشـتی شـەڕکەری سـەرەکی، سـەرکەشتی شـەڕ ⬡ ناو جنگی اصلی

**capital social** *noun*
سەرمایەی کۆمەڵایەتی ⬡ سرمایه‌ی اجتماعی

**capital sum** *noun*
سەرجەم سەرمایە، تێکڕای سەرمایە، سـەرمایەی سەرەتای دامەزرێنەران ⬡ کل سرمایه

**capital territory** *noun*
مەڵبەندی سـەرەکی (شـارێکی سـەرەکی وڵاتێ، ب.ت. ئەوسـترالیا، نایجریـا و پاکـستان) ⬡ تریتوری کاپیتال

**capital transfer** *noun*
بەنێوکردن یـان ڕاگوێـستنی دارایی و سـامان ⬡ انتقال ثروت

**capital transfer tax** *noun*
باجی بەنێوکردنی سـەرمایە یان سامان ⬡ مالیات بر انتقال ثروت

**capitate** /ˈkapɪteɪt/ *adjective, noun*
*adj* (ڕووەکناسـی و گیانەوەرناسـی) سـەری، سەرئاسـا *n* (توێکـاری) گـەورەترین ئێـسکی مەچـەک، لـە لـەپی دەسـت دایـە (بنـەڕەت: لـە *capitatus* لاتین، لە *caput* ،*capit-* "سـەر") ⬡ کاپیتیت

**capitation** /ˌkæpɪˈteɪʃn/ *noun*
1 باجی سـەرانە، سـەرانە، 2 poll tax سـەرژمێری ⬡ 1 مالیات سرانه، سرانه 2 سرشماری

**capitation tax** *noun*
باجی سـەرانە ⬡ مالیات سرانه

**Capito Hill** *noun*
لقـی قـانوونـدانـەری حکومـەتی ئـەمریکـا (لـە

واشینگتون، شوێنی کاپیتۆلی ئەمریکا) ۞ کاپیتو هیل

**Capitol** /ˈkæpɪtl/ *noun*
1 (خانووبەرە یان دەزگای) کۆنگرێسی ئەمریکا 2 نـاوی پەرسـگەی ژووپیتێـر لەسـەر تـەپی Capitoline لـە ڕۆمـی کـۆندا (بنـەڕەت: لـە *caput*، *capit-* لاتـیـن "سـەر "head") ۞ 1 کنگرەی آمریکا 2 کاپیتول

**Capitoline** *adjective*
کـاپیتۆلین، سـەربە کـاپیتۆل (لـە ڕۆمدا) یـا بـە خودای ژووپیتێر ۞ کاپیتولین

**capitular** /kəˈpɪtjʊlə/ *adjective*
1 سـەربە کۆمەڵـی ئـەکلیرکی 2 سـەربە capitulum ۞ کاپیتولار

**capitulary** /kəˈpɪtjʊləri/ *adjective, noun* (*pl.* capitularies)
*adj* سـەربە یـان پێـوەنـدی بـە کۆمەڵـی ئـەکلیرکی یـەوە هـەیـە *n* ئەنـدامی کۆمەڵـەی ئەکلیرکی ۞ کاپیتولاری

**capitulation** /kəˌpɪtʃuˈleɪʃn/ *noun*
(پەیمان‌نامە) بەدەستەوەدان، ڕادەست(کردن، بە مەرجەوە)، کورتە، تایبەت‌مافی بیانی، پەیمان‌نامە ۞ تسلیم، خلاصە، کاپیتولاسیون، معاهدە

**capitulations** *noun, pl.*
(مێژوویی) ئیمتیازات یا مافە تایبەتی‌یەکانی بیانی ۞ کاپیتولاسیون

**capitulum** /kəˈpɪtjʊləm/ *noun, pl.* capitula /-lə/
(ڕووەکناسـی و گیانەوەرناسـی) سـەرۆچکە، سەرچە، سەرژە، سەرەنێسک، دەرپەڕیوی‌یێکی خڕی بەشێکی توێکاری(یانە)، بەشێکی گرێ‌ناسا یا خڕ (یان گۆیی globose)، وەک هی سەری گوڵ یان سەری ئێسکێ (بنەڕەت: لە لاتینەوە، چکۆلێنراوی *caput* "سەر "head") ۞ کاپیتولوم

**caplet** /ˈkæplət/ *noun*
حوبی کەپسوولی (بنەڕەت: تێکەڵەی capsule + tablet) ۞ کاپلت

**caplin** = capelin

**capella** = a capella

**cap'n** /ˈkapn/ = capitan

**capo**[1] /ˈkapəʊ/ *noun, pl.* capos
سـەرۆکی سـەندیکای تاوانـی، ب.ت. مافیـا (بنەڕەت: لە *caput* لاتین "سەر") ۞ کاپو

**capo**[2] /ˈkapəʊ/ *noun,* also also capo tasto /ˌkapəʊ ˈtastəʊ/
سەری پەنجەگیر، سەرگیر، سەربەند (هی ژێ‌کانی ئامێرێکی موسیقایی پەردەدار؛ بنەڕەت: کورتـەی *capotasto* ئیتالیـایی "head of fingerboard") ۞ کاپو

**Capo di Monte** /ˌkapəʊ dɪ ˈmɒnteɪ, ˈmɒnti/ *noun*
جۆرێ چینی زۆربە سپی کە بە شێوازی rococo زۆر نەخشێنراوە (لە ناوی کۆشکی *Capo di Monte* نزیک بە ناپلیس) ۞ کاپو دی مانتی

**capoeira** /ˌkapəʊˈeɪrə/ *noun*
شێوەیێکی دیسپلین یان بەندوبەست و جوولەی لەشی، لە بنەڕەتا هی کۆیلە برێزیلی‌یەکان (لە پورتوگالی‌یەوە) ۞ کاپوایرا

**cap of liberty** *noun*
کـڵاوی ئـازادی (کڵاوێکـی قـووچ کـە دەدرا بـە کۆیلەکانی ڕۆم بـۆ ئـازادی‌یان، لەمدواییانەدا وەک هێمای کۆماری بەکاردێنرا) ۞ کلاه آزادی

**capon** /ˈkeɪpɒn, ˈkeɪpən, US -pɑːn/ *noun*
کەڵەشێری خەساو ۞ خروس اختە

**caponata** /ˌkapə(ʊ)ˈnɑːtə/ *noun*
(ئیتالیایی) جۆرێ چێشت ۞ نوعی غذا

**capot** /kəˈpɒt/ *noun*
(لە پیکێت‌دا piquet) بردنەوەی هەموو دوازدە دەست لە لایەن کەسێکەوە کە خاڵێکیشی بۆ حیساب دەکرێ ۞ کاپوت

**capote** /kəˈpəʊt/ *noun*
(مێژوویی و لە ئەمریکای باکووری) تەرگە یان چارۆکەی درێژی کڵاودار ۞ شنل بلند دارای کلاه

**cappa** *noun*
کڵاو، تەپڵە ۞ کلاه

**capper** *noun*
کڵاودروو ۞ کلاهدوز

**capping** *noun*
داپۆشین ۞ پوشش

**cappuccino** /ˌkæpuˈtʃiːnəʊ, US -noʊ/ *noun, pl.* cappuccinos
کـەپۆچینۆ، کـاپۆچینۆ (جـۆرێ قـاوە)، پیاڵـەیێ کەپۆچینۆ ۞ کاپوچینو، یک فنجان کاپوچینو

**capric acid** *noun*
ترشەڵۆکی کەپریک $C_{10}H_{20}O_2$ ۞ اسید کپریک

**capriccio** /kəˈprɪtʃɪəʊ/ *noun, pl.* capriccios
1 پارچەموسیقایێکی (کورت و ئازاد لە شێوەدا) کرژ 2 جۆرێ وێنەکێشی فانتیزی یان تێکەڵەیێ لە تایبەتمەندی خەیاڵی و ڕاستی ۞ کاپریچیو

**caprice** /kəˈpriːs/ *noun*
1 هـەوەس، کەڵکەڵـە، دڵـەکورکە، ئـارەزوو، ئیـشتیا، گـز، نگـە 2 ڕاڕایـی، تاوتـاوبوون، وازی‌وازیتی ۞ 1 هوس، بلهوسی 2 تلون مزاج

**capricious** /kəˈprɪʃəs/ *adjective*
1 وازی‌وازی، ڕاڕا، تاوتـاو، دەمدەمـی، هـووک، هەردەم لە هەوایێ 2 هەوەساوی، بەکەڵکەڵە 3 زووگۆڕ ۞ 1 دمدمی، متلون 2 هوس‌باز 3 متغیر

**capriciously** /kəˈprɪʃəsli/ *adverb*
ڕاڕایانە، تاوتاوانە ۞ بە طور دمدمی

**capriciousness** /kəˈprɪʃəsnəs/ *noun*
1 هـەوەس‌بـازی 2 ڕاڕایـی، تاوتـاوی ۞ 1 هوس‌بازی 2 تلون مزاج

**Capricorn** /'kæprɪkɔ:n, US -kɔ:rn/ *noun*
1 (ئەستێرەبینی) كارژۆلە، شاخبزنە (دەیەمین كـــەلوو لـــە زۆدیـــاك) 2 (the Goat) كۆئەستێرەیێكی constellation زۆدیاكی نێوان Sagittarius و Aquarius (بنـــەڕەت: لـــە capricornus لاتین، لە caper، capr- "بزن" + cornu "شاخ") ۞ 1 جَدی 2 كاپریكورن

**Capricornian** *adjective*
سەربە كەلووی كارژۆلە ۞ وابسته به جَدی

**caprine** /'kaprʌɪn/ *adjective*
بزنئاسا، شێوەبزن، لەبزنچوو، بزنی، بزنەكی (لە caprinus لاتـین، لـە caper، capr- "بـزن") ۞ بزمانند

**capriole** /'kaprɪəʊl/ *noun*
1 هەڵـبەزودابەز، هەڵـپەڕودابەڕ، هـەڵـبەزكێ، هەڵخـــستنەوە 2 بـازی بـەرزی ئەسـپ (بەسـەر كۆسـپدا) 3 جووتـە، لووشـكە (بنـەڕەت: لـە capriolo ئیتالیـــایی "بـــاز"، لـــە capriola "roebuck"، لە capreolus لاتین، چكۆلێتراوی caper، capr- "بـزن") ۞ 1 جـــستوخیـــز 2 كاپریول 3 جفتك

**capri pants** /kə'pri:/ *noun, pl.*, also capris
دەرپێ یا شەڵواری تەنگی ژنان ۞ كاپری پانتس

**caproic** /'kəprəʊɪk/ *adjective*
(كیمیـا) كـەپرۆیک، بزنیـك (لەبـەر بـۆنی بزنئاساكەی) ۞ كاپرونیک

**caproic acid** *noun*
ترشەلۆكی بزنیک یان كەپرۆئیک $C_6H_{12}O_2$: جۆرێ ترشەلۆكی چەوری ئاوەكی، لە چەوری شیر و كۆكۆنات و ڕۆن و چەوری دارخورمادا هەیە ۞ اسید كاپرونیک

**caprolactum** /ˌkaprə(ʊ)'laktam/ *noun*
(كیمیا) ئاوێتەیێكی كریستاڵی پێكهێنراو یان دەســكرد $C_6H_{11}NO$ كــە نــاونجیێكــە intermediate و لـە بـەرهـەمهێنـانی نـایلۆندا بـەكـاردێترێ (بنـەڕەت: لـە caproic acid + lactam) ۞ كاپرولاكتوم

**caprylic** *adjective*
كەپریلیک ۞ كپریلیک

**caprylic acid** *noun*
ترشەلـۆكی كـەپریلیک: شـلەیێكـی چـەور و بێڕەنگ $C_8H_{16}O_2$، بۆنێكی ناخۆشی هەیە، لە چـەوری و ڕۆنـەكـاندا دەسـت دەكـەوێ، و لـە بـواری گۆلاوسـازی و ڕەنـگ و ئێـستیرەكـاندا بەكاردێترێ ۞ اسید كپریلیک

**caps** /kæps/ *pl.* = capital letters

**Capsian** /'kapsɪən/ *adjective*
(شوێنەوارناسی) سەربە چاندی Palaeolithicی ئـەفریكای بـاكووری و باشـووری ئـەوروپا، دەگەڕێتـەوە بـۆ 8000-4500ی پـێشزایـین (بنـەڕەت: لـە Capsa لاتـین (ئێستا Gafsa لە تونس)، شوێنێ كە شتومەكی سەربەو فەرهەنگ و چاندە دۆزرایەوە + -ian) ۞ كاپسین

**capsizal** /kæp'saɪzəl/ *noun*
هەڵاوگێـــڕی، وەرگـــەڕان، ســـەروبنبـــوون، ئاوەژووبوون، هەڵگەڕانەوە ۞ واژگونی

**capsicum** /'kæpsɪkəm/ *noun, pl.* capsicums
1 گیـزک، بیبـاری دۆڵـمەیی، سـەوز یـا سـوور 2 ڕووەكی ئـەم بیبـارە [تـوخم *Capsicum*] ۞ 1 فلفل دلمەای، سبز یا قرمز 2 گیاه فلفل دلمەای

**capsid**[1] = mirid

**capsid**[2] *noun*, also protein coat
(میكرۆبناسی) پۆشە، پۆشـەک، پۆشـكە: بـەرگ یان قاپیلكی پرۆتینی پارچۆلكەیێكی ڤایرۆسی ۞ كاپسید

**capstan** /'kæpstən/ *noun*
لەنگەربەست، خولخولە یـان چـەرخی لەنگـەر، پێچكـــەی لەنگـــەر، گـــوریسخـــولێن، گوریسهەڵكەر، هەڵكەرە، ڕەوروەوەی لەنگەر، پێچكەی گوریس یان تەناف ۞ گردونەی لنگر

**capstone** /'kæpstəʊn, US -stoʊn/ *noun*
1 بەشی سەرەوەی بەدەنەی دیوار، سەردیوار 2 ترۆپک، لووتكە ۞ 1 جزء بالایی دیوار 2 اوج

**capsular** /'kæpsjʊlə(r), US -sələ(r)/ *adjective*
گولاجی، شێوەكەپسوول، كەپسوولی ۞ وابسته به كپسول، كپسولمانند

**capsulate** *adjective*, also capsulated
كەپـــسوولی، جێگرتـــوو لـــە كەپـــسوول، لـــە كەپسوولدانراو ۞ واقع در كپسول

**capsule** /'kæpsju:l, US 'kæpsl/ *noun*
1 كەپسول، دەرمانپۆش، قاوغەدەرمان، گولاج: *The medicine can be taken in tablet or capsule form* 2 كەپـسوولی بۆشـایی یـان كەشـتی ئاسـمانی 3 كورتـە، پوختـە 4 كـەلوو، بەرگەتوو، تووپۆش، قاپیلک، قاوغە، توودانک، تووپۆش ۞ 1 كپسول 2 كپسول فضایی 3 موجز، چكیده 4 پوشینه

**Capt** = captain

**captain** /'kæptɪn/ *noun*
1 سـەركردە، فەرماندەر 2 سـەردەستە، سەرتیپ، سەرتیم (تیمێكی وەرزشی) 3 ڕێبـەر، سـەرۆک، كاپیتـان، كەشـتیوان، خـەفتان 4 فرۆكـەوان 5 ئەفـسەرێ لە هێزی دەریایی بریتانیا، لە نێوان commander و admiralدا 6 ئەفـسەرێ لـە ئەرتەشی بریتانیا لە نێوان lieutenant و major دا (n) captainship؛ بنـەڕەت: ئینگلیـسی نێوەڕاست، لە *capitain* فـەرەنسی كۆن، لـە *capitaneus* late Latin "سەرۆک"، لە *caput*، *capit-* لاتین "سەر") ۞ 1 فرمانده 2 سردسته 3 كاپیتان، ناخدا 4 خلبان 5 ناخدا یكم 6 سروان

**captaincy** /'kæptənsi/ *noun*, also captainship, *pl.* captaincies
1 پلەوپایەی کەشتیوانی 2 سەردەم یا سەروبەندی کاپیتانی ◇ 1 مقام ناخدایی 2 دورەی کاپیتانی

**captain of industry** *noun*
بەڕێوەبەری کۆمپانی (پیشەسازی گەورە) ◇ مدیر شرکت

**caption** /'kæpʃn/ *noun*
1 نیونیشان، سەردێڕ 2 لێدوان، روونکردنەوە، سەرباس، باسکردن (فیلم، وێنە یان سەر پەردە) 3 دەستوور یا بڕیاری گرتن (بنەڕەت: لە *captio(n-)* لاتین، لە *capere* "گرتن") ◇ 1 عنوان 2 شرح 3 حکم دستگیری

**captious** /'kapʃəs/ *adjective*
(فەرمی) عەیبگر، ئیرادگر: *captious critics* (captiously /'kapʃəsli/ *adv*: عەیبگرانە، ئیرادگرانە؛ captiousness /'kapʃəsnəs/ *n*: عەیبگری، عەیبگیری، ئیرادگرتن) ◇ خردەگیر، ایرادگیر، ملانقطی

**captivating** /'kæptɪveɪtɪŋ/ *adjective*
سەرنجڕاکێش، دڵڕفێن، تەلیسماوی، enchanting: *We spent a week relaxing on the captivating island of Capri* ◊ *He found her captivating* (**captivatingly** /'kæptɪveɪtɪŋli/ *adv*) ◇ جذاب

**captivation** /ˌkæptɪ'veɪʃn/ *noun*
گیرۆدەیی، سەوداسەری، دڵتێچوون، دڵبەستەیی، هەڵفریواندن، لەخشتەبردن ◇ شیفتگی، فریبندگی

**captive** /'kæptɪv/ *noun, adjective*
*n* دیل، گیراو، یەخسیر، زیندانی، بەندی *adj* گیرۆدە، لەبەند، دڵبەستە، شەیدا، سەوداسەر، پێکراو ◇ *n* اسیر، محبوس *adj* گرفتار، شیفته

**captive audience** *noun*
گوێگری بەزۆری یان ناچاری (گوێگرێ کە هیچ ئازادییەکی نەبێ و بێجگەلە گوێگرتن هیچ چارەیەکی تری نەبێ) ◇ مخاطب اجباری

**captive balloon** *noun*
باڵۆنی عەرزبەند یان بە عەرزەوە بەستراو ◇ بالن کنترل‌شده

**captivity** /kæp'tɪvəti/ *noun, pl.* captivities
گیراوی، یەخسیری، دیلی، گیرۆدەیی ◇ اسارت

**captor** /'kæptə(r)/ *noun*
پێوەکەر، بەدیلگر، یەخسیرگر، دیلگر، یەخسیرکەر ◇ اسیرکننده

**capture** /'kæptʃə(r)/ *noun*
1 دیلی، گیراوی، یەخسیری 2 گرتن، دەسبەسەری، گلدانەوە، بنچاقکردن 3 داگیرکردن، گرتن 4 نێچیر، دەسکەوت 5 (فیزیک) مژین، گرتن، هەڵچنین ◇ 1 اسارت 2 دستگیری 3 تصرف 4 شکار، غنیمت 5 جذب

**Capuchin** /'kapʊtʃɪn/ *noun*
1 ڕەبەنی سەربە لقێکی توندی تیرەی Franciscan 2 (گیانەوەرناسی، capuchin) جۆرێ مەیموونی ئەمریکای باشووری فۆکلەبەسەر یان کلاونە [توخم *Cebus*: چوار جۆرن] 3 (capuchin) کراسێکی کلاوداری ژنانە 4 (capuchin) جۆرێ کۆتر، کۆترەکلاونە ◇ 1 راهب باشلق‌پوش 2، 3 و 4 کاپوچین

**Capulet** *noun*
بنەماڵەی Juliet لە ژولیەت و رۆمیۆی شەکسپیەردا ◇ کاپولت

**caput** /'keɪpət, US 'kæpətæpɪ *noun, pl.* capita
سەر، نووک ◇ سر

**capybara** /ˌkæpɪ'bɑːrə, US ˌkæpə'berə/ *noun, pl.* capybaras
بەرازی ئاوی، گیاخۆرە [ *Hydrochaerus hydrochaeris*] ◇ کاپیبارا

**car** /kɑː(r)/ *noun*
1 ماشێن 2 واگۆن 3 ئەڕابە، عەڕەبانە 4 (ئاسانسۆر) دیو، ژوور، ژوورۆچکە ◇ 1 خودرو 2 اتومبیل 3 واگن 4 اتاق

**carabao** *noun, pl.* same or carabaos
(لە فیلیپین) گامێشی هیندی ◇ کاراباو

**carabid** /'karəbɪd/ *noun*
(مێروناسی) قالۆنچەیێ (سەربە تیرەی قالۆنچە Carabidae)، ground beetle راویەکان دەگرێتەوە؛ بنەڕەت: لە *Carabidae* لاتینی نوێ، لە *carabus* لاتین، ئاماژە بە جۆرێ قرژاڵ) ◇ کارابید

**carabin** or carabine = carbine

**carabiner** = karabiner

**carabineer** /ˌkarəbɪ'nɪə/ *noun*, also carabinier
(مێژوویی) قەرەبینەبەدەست، قەرەبینەلەشان، شەستیربەدەست، شەستیرهەڵگر ◇ کارابینر

**carabiniere** /ˌkarəbɪ'njɛːri/ *noun, pl.* carabinieri pronunc. same
ئەندامی پۆلیسی نیمچەلەشکری ئیتالیایی ◇ کارابینری

**caracal** /'karəkal/ *noun*
گوێڕەشە: پشیلەیێکی شێوە lynx، ڕەسەنی ئەفریکا و رۆژاوای ئاسیا (بنەڕەت: لە *karakulak* تورکی، لە *kara* "ڕەش" + *kulak* "گوێ") ◇ کاراکال

**caracara** /ˌkarə'kɑːrə/ *noun, pl.* same or caracaras
سەقری کاراکارا [*Polyborus plancus* و جۆرەکانی تر] ◇ کاراکارا

**caracole** /'karəkəʊl/ *noun*
نیوەسووڕ بە ئەسپ بۆ لای چەپ یان ڕاست ◇

کاراکول
**caracul** /'kærekæl/ = karakul
**carafe** /kə'ræf/ *noun*
شووشەمەسینە، شووەتونگە، پارچ، پرتونگەیێ، تونگەبەر ۞ صراحی، به اندازەی یک تنگ
**caragana** /ˌkarə'gɑːnə/ *noun*
دەوەن یان دارچەیێکی ناوەندی ئاسیا یان سیبیریا، جاروبار بۆ جوانی دەکرێ [تۆخم *Caragana*] ۞ کاراگانا
**carambola** /ˌkar(ə)m'bəʊlə/ *noun*
1 جۆرێ میوەی زەردی ئەستێرەئاسا، = starfruit 2 داری گەرمێنانی ئەو میوە یان بەرە [*Averrhoa carambola*] ۞ کارامبولا
**caramel** /'kærəmel/ *noun*
کەرەمێل، شەکری سووتاو ۞ کارامل
**caramelization** *noun*
بە شێوەی شەکری سووتاو لێکردن ۞ کاراملیزاسیون
**carangid** /kə'randʒɪd/ *noun*
جۆرێ ماسی دەریایی لە تیرەی jack (Carangidae) ۞ نوعی ماهی
**carapace** /'kærəpeɪs/ *noun*
قاپیلک، لەپکە، قاپۆر، قاوغ، کاسە، قافک (لە ئێسک یان کیتین chitinous) ۞ لاک
**carat** /'kærət/ *noun*
1 قیرات (یەکەی کێش بەرامبەر بە 2/. گرەم یان 200 میلی‌گرەم) 2 (لە ئەمریکا هەروەها karat) پێوانەیێ بۆ پەتیتی زێر (کە 24 دانەی زێرێکی پەتی‌یە؛ بنەرەت: لە *keration* یۆنانی "بەر یان میوەی carob") ۞ قیراط
**caravan** /'kærəvæn/ *noun*
کاروان، قەتار، عەرەبانە، کاراڤان (بنەرەت: لە *caravane* فەرەنسی‌یەوە، لە *kārwān* ئێرانی‌یەوە) ۞ قافله، دلیجان، کاراوان
**caravanning** /'kærəvænɪŋ/ *noun*
رابواردن یا تێپەڕکردنی پشوو لە کاراڤانا ۞ سیر کردن تعطیلات در کاراوان
**caravanserai** /ˌkærə'vænsərаɪ, US -ri/ *noun*, also caravansary /ˌkærə'vænsəri/, *pl.* caravansaries
1 کاروانسەرا، کاروانخانە، خان، میوانخانە 2 کاروان، کاروانە، قەتارە (خەڵکی ڕێبوار، لە *kārwānsarāy* ئێرانی‌یەوە وەرگیراوە) ۞ 1 کاروانسرا، مهمانخانە 2 قطار
**caravel** /'karəvɛl/ *noun*, also carvel
کاراڤێل (= بەلەمی چارۆکەداری چکۆلەی توندڕەو) ۞ کاراول
**caraway** /'kærəweɪ/ *noun*
1 تووی زیرە یان ژیرە، کومین، تووی کومین 2 زیرە، ژیرە [*Carum carvi*] (بنەرەت: لە *carui* لاتینی سەدەکانی ناوەڕاست، لە *alkarāwiyā* عەرەبی، ڕەنگە لە *karon* یۆنانی‌یەوە بێ "cumin") ۞ 1 دانەی زیرە 2 زیرە
**caraway seed** *noun*
تووی کومین یا زیرە، تووی ژیرە ۞ دانەی زیرە
**carb**[1] = informal short for carburettor
**carb**[2] = informal short for carbohydrate
**carbamate** /'kɑːbəmeɪt/ *noun*
(کیمیا) کاربامیت: خوێ یان ئیستێرێ کە ئانیۆنی $OOCNH_2$- یان کۆمەڵی $NH_2COO$- تیایە ۞ کربامیت
**carbamic acid** *noun*
(کیمیا) ترشەڵۆکی کەربامیک: ترشەڵۆکێ $CH_3NO_2$ ۞ اسید کربامیک
**carbanion** /kɑː'banʌɪən/ *noun*
(کیمیا) کاربانیۆن: ئایۆنێکی ئەندامی بە بارگەی نەرێنی‌یەوە، لەسەر گەردیلە یان ئەتۆمێکی کاربۆن هەڵکەوتووە ۞ کربانیون
**carbaryl** /'kɑːbərɪl/ *noun*
(کیمیا) کارباریل: جۆرێ مێرووکوژی پێکهێنراو یان دەسکرد کە بۆ پاراستنی بەرووبوو و بۆ فەوتاندنی کێچ و ئەسپێ بەکاردێنرێ ۞ کرباریل
**carbide** /'kɑːbʌɪd/ *noun*
(کیمیا) کاربید، کاربایید: 1 ئاوێتەیێکی دووانی یان دووهاوهێزێ کاربۆن ب.ت. calcium carbide، ئاوێتەیێکی کاربۆنی لەگەڵ کانزایێ یان توخمێکی تر: *silicon carbide* 2 ماکێکی یەکجار سەخت کە لە کاربۆن یان یەک یان چەند کانزای قورس ساز دەکرێ ۞ کاربید
**carbine** /'kɑːbaɪn, US 'kɑːrb-/ *noun*
1 قەرەبینە، کارابین، شەستیر، شەشخانە، تفەنگی لوولەکورت یان musket کە سپای سوارە calvary بەکاری دێنا 2 چەک یان تفەنگی سووکی خۆکار ۞ کارابین
**carbineer** = carabineer
**carbinol** *noun*
(کیمیا) کاربینۆل، مێتانۆل؛ هەروەها ئەلکۆلێ کە لەمە بەرهەم هاتووە، methyl alcohol، ئەلکۆلێ کە لە مێتانۆل بەرهەم هاتووە ۞ کاربینول
**carb- or- carbo-** *prefix*
پێشگر: کاربۆن، کاربۆنی، کاربۆکسیل: *carbide* ۞ پیشوند: کربن، کربنی
**carbocation** /ˌkɑːbə(ʊ)'katʌɪən/ *noun*
(کیمیا) کاربۆکەیشن، کاربۆکاسیۆن ۞ کاربوکاسیون
**carbocyclic compound** *noun*
(کیمیا) ئاوێتەی کاربۆئەڵقەیی یان کاربۆسایکلی ۞ ترکیب کربوسیکلی
**carbohydrate** /ˌkɑːbəʊ'haɪdreɪt, US ˌkɑːrboʊ-/ *noun*
(کیمیا) کاربۆهایدرات، هایدراتی کاربۆن ۞ کربوهیدرات

**carbolic acid** /kɑː'bɒlɪk 'æsɪd, US kɑːr'bɑːlɪk/ *noun*, also carbolic or phenol 1 (کیمیـــا) ترشەڵـــۆکی کاربۆلیـــک، فینـــۆل: ئاوێتـــەیێکـــی کریـــستاڵی ژاراوی داکرێنـــەر $C_6H_5OH$، لە نێو قیری خەڵووز و داردا هەیە و لە گیـراوەی تـراو dilute دا وەک disinfectant بەکاردێتری ◌ اسید کربولیک

**car bomb** *noun*
بۆمبی ماشێنی: *a car bomb attack outside the embassy* ◌ بمب ماشینی

**carbon** /'kɑːbən, US 'kɑːrb-/ *noun*
1 کاربۆن (بە ز.گ. 6، ن. C): ◊ *carbon fibre* 2 کاغـەزی *carbon emissions/levels/taxes* کاربۆن یا کۆپی 3 کۆپی 4 رووژە یان ئەڵماسی تـەڵخ 5 (کـارەبـا) رەژی، خـەڵـووز، زووخـاڵ (بنەڕەت: لە *carbone* فەرەنسی، لە *carbo, carbon-* لاتینـــــەوە "charcoal ،coal") ◌ 1 کربن 2 کاربن 3 کپی 4 الماس کدر 5 (برق) زغال

**carbon 12** *noun*
کـاربۆنی 12، ئیزۆتـۆپێکی کـاربۆن بـە ژمـارەی بارسـتەیی 12 کە زۆر(وزەبەند)ترین ئیزۆتۆپی کاربۆنـە کـە وەک سـتاندارد یـان پێـوەرێ بـۆ پێوانەکانی measurement کێشی گەردیلـەیی atomic weight بەکاردێتری ◌ کاربون 12

**carbon 13** *noun*
کـاربۆنی 13، ئیزۆتـۆپێکی کـاربۆن بـە ژمـارەی بارسـتەیـی 13، دەوروبـەری 1/70 کـاربۆنی سروشـتی پێکـدێنێ، وەک شـوێن‌دۆز tracer بەکاردێتری ◌ کاربون 13

**carbon 14** *noun*
کـاربۆنی 14، ئیزۆتۆپێکی تیشکدەری قورسـی heavy radioactive کـاربۆن بـە ژمـارەی بارستەیی 14، ب.ت. وەک شوێن‌دۆز tracer بۆ لێکۆڵینـەوە و دیـاری‌کـردنی تـەمـەنی مـاک و مەتریاڵی کۆن (وەک نموونەی مەتریاڵ و مادەی کـۆن‌ناسـی palaeontology و شـوێنەوارناسـی archaeology) بەکاردێتری ◌ کاربون 14

**carbon-14 dating** = radiocarbon dating

**carbonaceous** *adjective*
کـاربۆنی، وەک کـاربۆن، کـاربۆن‌ناسا، کـاربۆنی تیایە، کاربۆن‌دار ◌ مانند کاربن، دارای کابن

**carbonado** /ˌkɑːbə'neɪdəʊ/ *noun, pl.* carbonados
جۆرێ رووژە یان ئەڵماسی تەڵخ (بنەڕەت: لە پۆرتوگالی‌یەوە) ◌ کاربونادو

**carbonate** /'kɑːbəneɪt/ *noun*
کابۆنەیت، کابۆنێیت، کاربۆنێیت ◌ کاربونیت

**carbonated** /'kɑːbəneɪtɪd, US 'kɑːrb-/ *adjective*
خـاوەنی گـازی کاربۆنیـک، دوانۆکـسـاید یـان دی‌ئۆکـسایدی کاربۆنی تیایە ◌ دارای گاز کربنیک

**carbonatite** /kɑː'bɒnətʌɪt/ *noun*
(زەوی‌ناسـی) تـواوە یـان بـەردی ئـاگرین کـە زۆربەی لە کاربۆنەیت پێکهاتووە ◌ کاربوناتیت

**carbon black** *noun*
رەشی کاربۆن، سیانی کاربۆن ◌ دودەی کربن

**carbon copy** *noun*
1 کـۆپی (بـە کاغـەزی کاربۆنـەوە) 2 هاوشـێوە، لێکچوو، چونیەک، هەرئەو، هاوتا، وەکیـەک ◌ 1 کپی 2 نظیر، عین، همانند

**carbon cycle** *noun*
سـووڕی کـاربۆن 1 (سـووڕی کـاربۆن لـە ئیکۆسیـستمی زەوی‌دا کـە لـەودا دوانۆکـسایدی کاربۆن بـەهـۆی ئۆرگـانیزم‌گـەلی رۆشـنەپێکهاتی photosynthetic organisms جێگیر دەبن بۆ پێکهێنـانی خـواردەمـەنی ئـەنـدامی organic nutrient و ئاخرسـەر دەگـەڕێنـەوە بـۆ دۆخـی نائـەنـدامی inorganic state (وەک بـەهـۆی هەناسـەدان، شی‌بوونـەوە یـان لێکـهەڵوەشـانی پرۆتۆپلاسمیک یـان combustion) 2 سـووڕی کاردانەوەگەلی گەرماناوکی thermonuclear کە لەودا چوار گەردیلە یان نەتۆمی هایدرۆژین دەبنە گەردیلەیێکی هیلیۆم (بەهـۆی کـرداری تـاودەرانـەی کـاربۆن لـەگـەڵ ئـازادبوونی وزەی نـاوکی nuclear energy و سـەرچـاوە یـان ژێدەرێکی source بنەڕەتی وزەی تیشکدانەوەی خۆر و (هێندێ لە) ئەستێرەکانە) ◌ چرخەی کربن

**carbon dating** *noun*
رێکەوت‌دانانی کاربۆنی (= شێوازی لێکدانەوەی تەمەنی شتەکانی بەر لە مێژوو (وەک نموونەی کەرستە و مەتریاڵی کۆن‌ناسی palaeontology و شوێنەوارناسی archaeology) بەهۆی پێوان و ئەندازەگرتنی بڕی کاربۆنی رادیۆئەکتیف (ی 12 و 14) لەواندا) ◌ تاریخ‌گذاری کربنی

**carbon dioxide** *noun*
دوانۆکـسیدی کـاربۆن، دی‌ئۆکـسایدی کـاربۆن، گازی کاربۆنیک $CO_2$ ◌ دی اکسید کربن

**carbon fibre** *noun*
ریشاڵی کاربۆنی ◌ لیف کاروبنی

**carbonic** /kɑː'bɒnɪk/ *adjective*
سـەربە کـاربۆن یـا carbonic acid یـانیش دوانۆکـسایدی کاربۆن ◌ کربنی

**carbonic acid** /kɑːˌbɒnɪk 'æsɪd, US kɑːrˌbɑːnɪk/ *noun*
ترشەڵۆکی کاربۆنیک $H_2CO_3$ ◌ اسید کربنیک

**carbonic acid gas** = carbon dioxide

**carbonic anhydrase** *noun*
جـۆرێ هـەوێنـەی زینـکداری نێـو شـانە زیندووەکان (وەک خڕۆکە سوورەکانی خوێن)، هەوێنەیێ کە تاوی شی‌بوونەوەی ترشەڵۆکی کاربۆنیک دەدا ◌ انهیدراز کربنیک

**carboniferous** /ˌkɑːbə'nɪfərəs, US

ˌkɑ:rb-/ *adjective*
خەڵووزی، خەڵووزدار، خەڵووزاوی، خەڵووزی تیایە یان بەرهەم دێنێ ⬡ دارای زغال

**Carboniferous** /ˌkɑ:bəˈnɪfərəs, US ˌkɑ:rb-/ *adjective*
خەڵووزین(ە)، خەڵووزان: سەربە پێنجەمین سەردەم لە سەردەمانی Palaeozoic era لە مێژووی زەویناسیدا (نێوان سەردەمەکانی دیڤۆنیەن Devonian و پێرمیەن Permian، دەوروبەری 393 تا 290 میلیۆن ساڵ لەوە پێش)، ئەو دەمەی کەوا نیشتووە خەڵووزییەکان پێکهاتن، کاربۆنیفێر ⬡ زغالینە، کاربۆنیفر

**Carboniferous period** *noun*
سەردەمی خەڵووزان یان خەڵووزین(ە) ⬡ دورەی زغالینە

**carbonium** /kɑ:ˈbəʊnɪəm/ *noun*
(کیمیا) کاربۆنیۆم ⬡ کاربونیم

**carbonium ion** *noun*
(کیمیا) ئایۆنێکی ئەندامی بە بارگەی گەرم یان ئەرێنییەوە، لەسەر گەردیلەیێکی کاربۆنە ⬡ یون کاربونیم

**carbonization** /ˌkɑ:bənaɪˈzeɪʃn, US ˈkɑ:rb-/ *noun*
خەڵووزاندن، کاربۆناندن، گۆڕین یان کردنە کاربۆن ⬡ کربنی‌سازی

**carbon monoxide** *noun*
تاکۆکسایدی یان یەکۆکسایدی کاربۆن CO ⬡ اکسید کربن

**carbonous** *adjective*
کاربۆنی ⬡ وابستە بە کربن

**carbon paper** *noun*
کاغزی کۆپی یان هەڵگرتنەوە، کاربۆن ⬡ کاغذ کاربن

**carbon steel** *noun*
پۆڵای کاربۆنی ⬡ استیل کاربن

**carbon tax** *noun*
خەڵووزانە، باجی کاربۆن(ی)، بەجێ لەسەر نەوت یان سووتەمەنی تری بووبەردی ⬡ مالیات کاربن

**carbon tetrachloride** *noun*
چوارۆکلۆرایدی کاربۆن $CCl_4$، شلەیێکی ژاراوی ناگرکێشی بێ ڕەنگ، وەک توێنەر solvent و مەتریاڵی ساردکەرەوە refrigerant بەکاردێتێ ⬡ تتراکلورید کربن

**carbonyl** /ˈkɑ:bənʌɪl, US -nɪl/ *noun*
(کیمیا) کاربۆنیل CO، ئامازە بە بنەڕەتی دووهاوهێزی divalent radical، لە aldehyde، ketone، carboxylic acid، ester و زۆر ئاوێتەی ئەندامی تردا هەیە ⬡ کربونیل

**carbonylation** *noun*
کاربۆنیلاندن ⬡ کربونیلاسیون

**carbonylic** *adjective*
کاربۆنیلی، سەربە کاربۆنیل ⬡ وابستە بە کربونیل، کربونیلی

**car-boot sale** *noun*
هەرزانفرۆش(کردن)ی یا هەڕاجی شڕەوشاتاڵی نێومال ⬡ حراج خرت‌وپرت‌های خانە

**Carborundum** /ˌkɑ:bəˈrʌndəm, US ˌkɑ:rb-/ *noun*, also carborundum
کاربۆراندوم (= ئاوێتەیەکی سەختە لە کاربۆن و سیلیکۆن، بۆ مەبەستی کڕاندن و ساوین) ⬡ کربوراندوم

**carboxyl** /kɑ:ˈbɒksʌɪl, US -sɪl/ *noun*
(کیمیا) کاربۆکسی، کاربۆکسایل ⬡ کربوکسیل

**carboxylase** /kɑ:ˈbɒksɪleɪz/ *noun*
(کیمیا) کاربۆکسیلیز، کاربۆکسیلاز: هەوێنەیێ کە carboxylation یان decarboxylation تاودەدا ⬡ کربوکسیلیز، کاربوکسیلاز

**carboxylation** *noun*
(کیمیا) کاربۆکسیلاندن، کاربۆکسیلایشن ⬡ کربوکسیل‌دار کردن

**carboxylic acid** /ˌkɑ:bɒkˈsɪlɪk/ *noun*
(کیمیا) ترشەڵۆکی کاربۆکسیلی: ترشەڵۆکێکی ئەندامی (وەک acetic acid) کە یەک یان چەند کۆمەڵی کاربۆکسیلی تیایە ⬡ اسید کربوکسیلی

**carboxylic group** *noun*
(کیمیا) گرووپ یان کۆمەڵەی کاربۆکسیلی ⬡ گروه کربوکسیلی

**carboy** /ˈkɑ:bɔɪ, US ˈkɑ:rbɔɪ/ *noun*
کەڵەبەشتو، دەفری پارێزەدار (بۆ هەڵگرتن یان ڕاگوێستنی شلە مەترسیدارەکان) ⬡ غرابە، ظرف حفاظ‌دار

**carbuncle** /ˈkɑ:bʌŋkl, US ˈkɑ:rb-/ *noun*
1 شێرپەنجە، موو 2 دمەڵ، کوان 3 گەوهەری شەوچرا، جەواهێری سوور ⬡ 1 کفگیرک 2 کورک 3 جواهر قرمز

**carbuncular** /ˈkɑ:bʌŋkjʊlə(r)/ *adjective*
1 شێرپەنجەیی، موویی، سەربە شێرپەنجە 2 دمەڵی، کوانی ⬡ 1 وابستە بە کفگیرک 2 کورکی

**carburettor** /ˌkɑ:bəˈretə(r), US ˈkɑ:rbəreɪtər/ *noun*, also carburetor /ˌkɑ:bəˈretə(r), US ˈkɑ:rbəreɪtər/
(میکانیک) کاربراتۆر ⬡ کاربراتور

**carcajou** /ˈkɑ:kədʒu:, US -ɔʒu:/ = wolverine

**carcass** /ˈkɑ:kəs, US ˈkɑ:rkəs/ *noun*, also carcase /ˈkɑ:kəs/
1 لاشە، لاک، کەلاک، جەندەک، کەلەخ، کەلەش، تافێر 2 (مریشک) ئێسک‌وپروسک 3 لاشە، چوارچێوە، بەدەنە، پەیکەر 4 بەرماوە، پاشماوە ⬡ 1 لاشە، نعش، جسد 2 استخوان مرغ 3 اسکلت 4 باقی‌ماندە

**carceral** /'kɑ:s(ə)r(ə)l/ *adjective*
(دەگمەن) سەربە زیندان، بەندیخانەیی ◯ وابسته به زندان

**carcin(o)-** *prefix*
پێشگر: شێرپەنجە، قرژاڵە، تومور: *carcinogenic* (بنەڕەت: لە *karkin-* *karkino-* یونانی، لە *karkinos* "crab") ◯ پیشوند: سرطان، تومور

**carcinogen** /kɑ:'sɪnədʒən, US kɑ:r's-/ *noun*
مەتریالی شێرەنجەپێهەڵێن، شێرپەنجەپێوەبوو، مەتریالی شێرپەنجاوی ◯ مادەی سرطانزا

**carcinogenesis** *noun*
شێرپەنجەپێوەبوویی، پێکهاتنی شێرپەنجە ◯ سرطانزایی

**carcinogenic** /ˌkɑ:sɪnə'dʒenɪk, US ˌkɑ:rs-/ *adjective*
شێرەنجەپێهەڵێن، شێرپەنجەپێوەبوو، شێرپەنجاوی ◯ سرطانزا

**carcinogenicity** *noun*
شێرەنجەپێهەڵێنی، شێرپەنجاویبوون ◯ سرطانزایی

**carcinoid** /'kɑ:sɪnɔɪd/ *noun*
(پزشکی) لوو یان تومۆری ب.ت. لە پەلەریخۆڵەدا appendix و جاروبار هۆرمۆن دەردەدا، جۆری تومۆری پێتایدەردەر، ب.ت. لە دەزگای gastrointestinal و سییەکاندا دۆزراوەتەوە ◯ کارسینوئید

**carcinology** *noun*
1 شێرپەنجەناسی 2 (گیانەوەرناسی) قرژاڵناسی، قرژانگناسی ◯ 1 سرطانشناسی 2 خرچنگشناسی

**carcinoma** /ˌkɑ:sɪ'nəʊmə, US ˌkɑ:rsɪ'noʊmə/ *noun, pl.* carcinomas or carcinomata /-mətə/
لووی شێرپەنجەیی (بنەڕەت: بە ڕێگای لاتینەوە، لە *karkinōma* یونانییەوە "crab") ◯ غدەی سرطانی

**carcinomatosis** *noun*
دۆخێ کە لەودا لە سەرتاسەری لەش کۆمەڵێ لووی شێرپەنجەیی دەردەکەوێ (یان پەیدا دەبێ)، دۆخێ کە لەودا چەندین لووی شێرپەنجەیی هاوکات پاش بلاوبوونەوە یان تەنینەوەی لە سەرچاوەی سەرەتاییەوە پەرە دەسێنێ یان پەیدا دەبێ ◯ کارسینوماتوز

**carcinomatous** *adjective*
شێرپەنجەیی، خاوەنی لووی شێرپەنجەیی ◯ سرطانی، دارای غدەی سرطانی

**card**[1] /kɑ:d, US kɑ:rd/ *noun*
1 کارت، پسوولە 2 پەڕ (هی یاری) 3 کارتی پیرۆزبایی 4 کەسێکی نائاسایی یان پێکەنینی 5 شانە، شیکەنە ◯ 1 کارت، ورق 2 ورق بازی 3 کارت پستال 4 آدم غیرعادی یا مضحک 5 ماشین شانەزنی

**card**[2] /kɑ:d, US kɑ:rd/ *noun*
شانە، دەفە، شیکەنە ◯ ماشین شانەزنی

**cardamom** /'kɑ:dəməm, US 'kɑ:rd-/ *noun,* also cardamon
(ڕووەکناسی) 1 دەنک یان تۆی هێل 2 هێل، حێل [*Elettaria cardamomum*] ◯ 1 دانەی هل 2 هل

**cardboard** /'kɑ:dbɔ:d, US 'kɑ:rdbɔ:rd/ *noun, adjective*
*n* کارتۆن، مقەبا: *adj a cardboard box* دەسکرد، ناڕاست، درۆ، ناسروشتی، فشە، فیشالی، *a novel with* :stereotyped ،unreal *superficial cardboard characters* ◯ *n* مقوا *adj* مصنوعی، غیرطبیعی

**cardboard city** *noun*
شاری مقەبایی، کارتۆنەشار، شاری کارتۆنی ◯ شهر مقوایی

**card-carrying** *adjective*
ئەندامی چالاک یا فەرمی ◯ عضو فعال یا رسمی

**card-carrying member** *noun*
ئەندامی فەرمی (پارتی، ڕێکخراوە و هتد) ◯ عضو رسمی

**carder** *noun*
شیکەنەوان، شیکەرەوە، شیکەنەچی ◯ شانەزن

**card-game** *noun*
پەڕی یاری ◯ ورق بازی

**cardholder** /'kɑ:dhəʊldə(r), US 'kɑ:rdhoʊl-/ *noun*
خاوەنکارت (کارتی باوەڕی لە بانک) ◯ صاحب کارت

**cardi- or- cardio** /'kɑ:diəʊ, US 'kɑ:rdioʊ/ *prefix*
پێشگر: دڵ، دڵ و...: *cardiograph*، *cardiovascular*، *cardiogram* (بنەڕەت: لە *kardia* یونانی "heart, cardia") ◯ پیشوند: قلب، قلب و...

**cardia** /'kɑ:dɪə/ *noun, pl.* cardiae or -dias
(توێکاری) کونی سەرووی گەدە یان مێعدە، شوێنێ کە سووریچک oesophagus دەچێتەنێوی (بنەڕەت: لە *kardia* یونانییەوە "دڵ") ◯ کاردیا

**cardiac** /'kɑ:diæk, US 'kɑ:rd-/ *adjective, noun*
*adj* 1 دڵی، سەربە دڵ، هەڵکەوتوو نزیک بە دڵ؛ *cardiac* سەربە کاردیای مێعدە: *cardiac disease/failure/surgery* 2 سەربە یان بە نەخۆشی دڵ تووش بووە: *n cardiac patients* کەسێ کە نەخۆشی دڵی هەبێ ◯ *adj* 1 قلبی، وابسته به قلب 2 کاردیاک *n* شخصی با بیماری قلبی

**cardiac arrest** *noun*
دلـــەکپێ، راوێـــــتان یـــان پەککـــەوتنی دڵ، دڵوەستان، وەستانی کاتی یان هەمیشەیی ترپەی دڵ ۞ ایست قلبی

**cardiac muscle** *noun*
ماسوولکەی دڵ ۞ ماهیچەی قلبی

**cardiac surgery** *noun*
برینکاری دڵ، نەشتەرگەری دڵ ۞ جراحی قلبی

**cardialgia** /ˌkaːdɪˈældʒɪə/ *noun*
دڵێشە، دڵئێشە، ژانەدڵ ۞ درد قلب

**cardigan** /ˈkaːdɪgən, US ˈkaːrd-/ *noun*, also cardigan sweater
کراسی خوری (شەڕی Crimean): لە ناوی Earl ی *Cardigan*، کـــە یـــەکـــەم جـــار سەربازەکانی ئەم کراسەیان لەبەر کرد) ۞ ژاکت

**Cardigan Welsh corgi** *noun*, also Cardigan
جۆرێ corgi گوێخر و کلکدرێژی ویلز ۞ کوردیگان

**cardinal**[1] /ˈkaːdɪnl, US ˈkaːrd-/ *adjective*
بنگەهی، بنچینەیی، بنەڕەتی، سەرەکی، بناخەیی، گرنگ، بەرکـەفتی: *Respect for life is a cardinal principle of English law* ۞ اساسی، عمده، مهم

**cardinal**[2] /ˈkaːdɪnl, US ˈkaːrd-/ *noun*
1 کاردینال (= پایەبەرزترین قەشە لە کلێسەی کاتۆلیکی رۆم) 2 (گیانەوەرناسی) سوورەسەیرە، سەیرەی سوور، نێرەکەی بەشێکی یان تەواوی سوورە و زۆرتریش پۆپەی هەیە یان کلاونەیە [*Cardinalis cardinalis*] و جۆرەکانی تر، ژێرخێزان [Cardinalinae] 3 ژمارەی بنەڕەتی (1، 2، 3، 4 و هتد) ۞ 1 کاردینال 2 سهرەی سرخ 3 عدد اصلی

**cardinal**[3] /ˈkaːdɪnl, US ˈkaːrd-/ *adjective, noun*
(رەنگ) سووری توند ۞ (رنگ) قرمز تند

**cardinalate** *noun*
پۆست یان پلەوپایەی کاردینالی، کاردینالێتی ۞ مقام کاردینالی

**cardinal flower** *noun*
lobelia یێکی گوڵئاڵی درێژ. لە ئەمریکای باکووریدا دەبینرێ [*Lobelia cardinalis*] ۞ نوعی گیاه

**cardinal humour** = humour

**cardinally** /ˈkaːdɪnli, US ˈkaːrd-/ *adverb*
لە بنەڕەتەوە ۞ اساساً

**cardinal number** *noun*
ژمارەی بنەڕەتی، ژمارەی بنچی (وەک یەک، دوو، سێ و هتد. لە بەرامبەر ژمارەی ریزی یان پلەیی ordinal number، وەک یەکەمین، دووهەمین، سێهەمین و هتد.) ۞ عدد اصلی

**cardinal points** *noun, pl.*
چوار لای سەرەکی، چوارلاکان ۞ جهات اصلی

**cardinal sin** *noun*
گوناهی گەورە ۞ گناه کبیره

**cardinal virtue** *noun*
یەکێ لە چوار چاکە یان چاکی سروشتی کە بە کۆندا پێناسەی کراوە کە بریتین لە: هۆشیاری (یان ژیری) prudence، داد justice، نەرمڕەوی temperance و خـــۆڕاگری fortitude ۞ (در جمع) فضائل اصلی

**cardinal vowel** *noun*
(دەنگناسی) بزوێن یان ڤەوئێلی بنەڕەتی ۞ واکەی اصلی

**card index** *noun*, also index, (both BrE) (US card catalog)
کاتالۆگ ۞ فهرست برگەای

**carding** *noun*
شانەکردن، شیکردنەوە، شیکەنەکاری، شی ۞ عمل شانه کردن

**carding machine** *noun*
شیکەنە ۞ ماشین شانه کردن

**cardi(o)-** /ˈkaːdiəʊ, US ˈkaːrdioʊ/

**cardiogenic** *adjective*
کاردژێنیک، بەهۆی باری دڵییەوە تووش دەبێ، لە دڵەوە سەرچاوە دەگرێ یان پەیدا دەبێ یان دێتەڕوو: *cardiogenic shock* ۞ قلبزا

**cardiogram** /ˈkaːdɪə(ʊ)gram/ *noun*
کاردیۆگرام و دڵۆگرام ۞ قلبنگار

**cardiograph** /ˈkaːdɪə(ʊ)graːf/ *noun*
کاردیۆگراف، دڵۆگراف ۞ قلبنگار

**cardiography** *noun*
کاردیۆگرافی، دڵۆگرافی (cardiographic *adj*) ۞ قلبنگاری

**cardioid** *noun, adjective*
(بیرکاری) *n* چەماوەی شێوەدڵ *adj* شێوەدڵی ۞ کاردیود

**cardiological** *adjective*
سەربە پسپۆڕیی لە دڵدا، سەربە پزشکیتی دڵ ۞ وابسته به قلبپزشکی

**cardiologist** /ˌkaːdiˈɒlədʒɪst, US ˌkaːrdiˈaːl-/ *noun*
پسپۆڕی دڵ، پزشکی دڵ ۞ قلبپزشک

**cardiology** /ˌkaːdiˈɒlədʒi, US ˌkaːrdiˈaːl-/ *noun*
پسپۆڕی لە دڵدا، پسپۆڕیی دڵ، پزشکیتی دڵ ۞ قلبپزشکی

**cardiomegaly** /ˌkaːdɪəʊˈmɛgəli/ *noun*
(پزشـــکی) گـــەورەبوونی (نائاســـایی) دڵ ۞ کاردیومگالی

**cardiomyopathy** /ˌkaːdɪəʊmʌɪˈɒpəθi/ *noun, pl.* cardiomyopathies

(پزشکی) نەخۆشی درێژخایەنی ماسوولکەی دل ◌ کاردیومیوپاتی

**cardiopathy** *noun, pl.* cardiopathies
(هەر) نەخۆشی (ئێکی) دل ◌ بیماری قلب

**cardiopulmonary** *adjective*
(پزشکی) سەربە دل و سییەکان، کاردیۆپالمینێری ◌ کاردیوپولموناری

**cardiopulmonary resuscitation** *noun*
ژیاندنەوە یان بووژاندنەوەی دل و سییەکان (= گێرانەوەی هەناسەدانی ئاسایی پاش هێرشێکی دلی) ◌ کاردیوپولموناری ریاسیتاسیون

**cardiorespiratory** *adjective*
سەربە یا پێوەندی بە دل و دەزگای هەناسەدانەوە هەیە ◌ کاردیورسپراتوری

**cardiothoracic** *adjective*
دلیسنگی، سەربە یان دل و سنگ دەگرێتەوە، تایبەتمەندی دل و سنگە: *cardiothoracic surgery* ◌ وابستە بە یا شامل قلب و سینە

**cardiotonic** *adjective, noun*
تۆنۆسی tonus ماسوولکەی دل زیاد دەکا ◌ کاردیوتونیک

**cardiovascular** *adjective*
(پزشکی) سەربە دل و رەگەکانی خوێن ◌ کاردیوواسکیولار

**carditis** /kɑːˈdʌɪtɪs/ *noun*
(پزشکی) هەوکردنی دل، ئاوسانی دل، دلەئاوسێ ◌ التهاب قلب

**card key** = key card

**cardoon** /kɑːˈduːn/ *noun*
جۆرێ گیای درێژی thistle ئاسا، سەربە globe artichoke گەلا و رەگی دەخورێ [*Cynara carduncululs*] ◌ نوعی گیاه

**cards** *noun, pl.*
دەستەپەڕ، دەست (52 پەڕ)، پەڕێن، پاستۆڕ، وەرەقبازی، پەڕبازی، قوماری پەڕ ◌ دست ورق، بازی ورق

**card-sharp** *noun,* also card-sharper
قومارکەر یان قوماربازی پیشەیی، کارتباز، شارەزا یان کولاو لە قوماربازیدا، قوماربازی چاک ◌ قمارباز ماهر

**card-table** *noun*
میزی قومار یان پەڕێن ◌ میز قمار یا ورقبازی

**card vote** = black vote

**cardy** = cardigan, also cardie

**care** /keə(r), US ker/ *noun*
1 ئاگاداری، وریایی، هۆشیاری، ئاگالێبوون، بەدیارەوەبوون، چاوبەسەرەوەبوون، لەبەرچاوگرتن، بەتەنگەوەبوون، بیر(لابوون)، دل(لابوون)، لالێدانەوە، سەرنج، وردبوونەوە، لێخوردبوونەوە، چاودێری 2 دلەراوکە، دلەکورکە، نگەرانی، دل لەدوایی 3 بەرپرسایەتی ◌ 1 مراقبت، مواظبت، توجە، اندیشە، ملاحظە، سرپرستی، پرستاری 2 دلواپسی 3 مسؤلیت

**care assistant** = care worker

**career** /kəˈrɪə(r), US kəˈrɪr/ *noun, adjective*
*n* 1 کار، پیشە، ئیش، خەبات، شوول 2 ژیوار، بەرێچوون 3 رێڕەو، رێچکە 4 خێرایی (توندوتیژ)، لەز 5 سەردەم، رۆژگار، قۆناخ *adj* کاری، پیشەیی ◌ *n* 1 شغل، حرفە 2 زندگی 3 مسیر 4 سرعت 5 دوران *adj* شغلی

**career girl** = career woman

**careerism** /kəˈrɪərɪzəm, US -ˈrɪr-/ *noun*
کارپێخۆشی، کارخۆشەویستی، کاردۆستی ◌ کاردوستی

**careerist** /kəˈrɪərɪst, US -ˈrɪr-/ *noun*
کارپێخۆش، کارخۆشەویست، کاردۆست ◌ کاردوست

**career woman** *noun*
ژنی کارپێخۆش یان کاردۆست ◌ زن کاردوست

**carefree** /ˈkeəfriː, US ˈkerf- *adjective*
بێخەم، ئاسوودە، (خەیاڵ)تەخت، بێئەندیشە، بێدەربەست، سەرسووک، بێخەیاڵ ◌ بی‌خیال، فارغ‌البال

**careful** /ˈkeəfl, US ˈkerfl/ *adjective*
1 هۆشیار، وریا، تێبین، ئاگادار، چاوبەسەر، چاودێر، بەدیارەوەبوو 2 ورد، بەسەرنج ◌ 1 مواظب، بااحتیاط، مراقب 2 بادقت

**carefully** /ˈkeəfəli, US ˈker-/ *adverb*
بەهۆشیارییەوە، بە پارێزەوە، بە وریاییەوە: *Drive -fully* ◌ با احتیاط

**carefulness** /ˈkeəflnəs, US ˈkerflnəs/ *noun*
1 هۆشیاری، ئاگاداری، وریایی، ئاگالێبوون، تێبینی، چاوبەسەری 2 وردی، وردبوونەوە، بەسەرنجی ◌ 1 احتیاط 2 دقت، مراقبت

**caregiver** /ˈkeəgɪvə(r), US ˈkerg-/ = carer

**careless** /ˈkeələs, US ˈkerləs/ *adjective*
ناهۆشیار، بێسەرنج، هەلەشە، کەترە، سەرچل، لامسەرلا، بێخەم، گوێپێنەدەر، کەمتەرخەم، ئاسوودە ◌ بی‌احتیاط، بی‌توجە، آسودە

**carelessly** /ˈkeələsli, US ˈkerləsli/ *adverb*
بێسەرنجانە، سەرچلانە، بە خەمشەسەرێ ◌ با بی‌دقتی

**carelessness** /ˈkeələsnəs, US ˈkerləsnəs/ *noun*
بەتەنگەوەنەبوون، گوێپێنەدان، بێسەرنجیتی، سەرچلی، کەترەیی، هەلەشەیی، لامسەرلایی، کەمتەرخەمی ◌ بی‌دقتی، بی‌مبالاتی

**care of** = c/o
(پۆست) لەلایەن، بەهۆی، بەدەستی ◌ بە وسیلەی، توسط

**carer** /ˈkeərə(r), US ˈker-/ *noun*
نەخۆشیار، بەدیارەوەبوو، ئاگادار، چاوبەسەر ⬡ پرستار، مراقب

**caress** /kəˈres/ *noun*
دەسبەسەرداهێنان، دەس‌پیاهێنان، نـاز، لـە باوەش‌گرتن، ماچ‌وموچ کردن، بە قوربان و سەدەقە بوون، لاواندنەوە ⬡ نوازش

**caret** /ˈkærət/ *noun*
هەشتە، نیشانەی «^» بۆ بەجێ‌مان و کەوتن یان زیادکردن ⬡ کارت

**caretaker** /ˈkeəteɪkə(r), US ˈkert-/ *noun, adjective*
*n* 1 سەرپەرشت، سەخبێر، بەسەرڕاگەیشتوو، چـاودێر، زێرەڤـان 2 مالـەوان، دالان‌دار *adj* بـەڕوەخت، کـاتی: *a caretaker manager/government* ⬡ *n* 1 نـاظر، قـیم، مباشر 2 سرایدار *adj* موقت

**caretaker government** *noun*
حکومەتی کاتی ⬡ دولت موقت

**care worker** *noun*
کەسێ کە کاری یارمەتی و ئاگالێ‌بوونی خەڵکانی نـەخۆش و پەککەوتەیـە (ب.ت. لـەباری هۆشی‌یەوە) بەتایبەت ئەو کەسانەی کەوا لە مال یان نەخۆش‌خانەیەکی تایبەتی دان ⬡ کارورکر

**careworn** /ˈkeəwɔːn, US ˈkerwɔːrn/ *adjective*
دلپڕ، خـەمبار، دەس‌بەئەژنۆ، خـەم‌داهێنـاو: *her careworn features* ⬡ غمگین

**carex** /ˈkɛːrɛks/ *noun, pl.* carices /-rɪsiːz/
جەگەنێ لە تیرەیێکی بەبالا، زۆرتر لە ناوچە سـارد و فێنکـەکان‌دا دەبینـرێ [تـوخم *Carex*] (بنەڕەت: لە لاتینەوە "sedge") ⬡ کارکس

**carfare** /ˈkɑːfɛː/ *noun*
کرێی ماشێن ⬡ کرایەی ماشین

**car-ferry** *noun*
کەشتی ماشێن‌هەڵگر ⬡ کشتی حامل اتومبیل

**cargador** /ˌkɑːgəˈdɔː/ *noun, pl.* cargadores /ˌkɑːgəˈdɔːrɪz/
(لـە بەشـەکانی سـپانیایی‌زمـان‌دا و ئـەمریکا) کۆلکێش، حەماڵ، بارەبەر ⬡ حمال، باربر

**cargo** /ˈkɑːgəʊ, US ˈkɑːrgoʊ/ *noun, pl.* cargoes or cargos
بار (فڕۆکە، کەشتی و هتـد)، freight: *a cargo ship* ⬡ محموله

**cargo plane** *noun*
فڕۆکەی بارهەڵگر ⬡ هواپیمای باری

**cargo ship** *noun*
کەشتی بارهەڵگر ⬡ کشتی باری

**Carib** /ˈkarɪb/ *noun*
1 ئەندامی گەلێکی ڕەسەنی ئەمریکای باشووری، کە زۆربەیان لە ناوچە کەناری‌یەکانی Guianaی Venezuela و Guyana ،Suriname فەرەنسی، نیشتەجێن 2 زمانی کارائیب ⬡ کارائیب

**Cariban** /ˈkarɪb(ə)n/ *noun, adjective*
*n* خێـزانی زمانـانی ئـەمریکای باشـووری کـە بـریتی‌یـە لـە Carib، زۆربـەیان تیـاچوون یـان ڕوولەتیاچوون *adj* سـەربە زمانانی کـاریبی ⬡ کاریبان

**Caribbean** /ˌkarɪˈbiːən, US kəˈrɪbɪən/ *adjective*
سـەربە ئـەو ناوچانـەی کـە دەریـای کارائیـب، دوورگەکانی و کەنارەکانی دەوروبەری دەگرێتەوە ⬡ کاریبان، وابسته به دریا یا جزائر کارائیب

**caribe**, *pl.* caribes = piranha

**caribou** /ˈkærɪbuː/ *noun, pl.* same
گاکێوی ئەمریکای باکووری، بەفرەماڵە، کاریبۆ (بنەڕەت: لە فەرەنسی کەنەدایی، لە *γalipu* بە واتای "بەفرماڵ") ⬡ کاریبو

**caricatural** *adjective*
سـەربە کاریکـاتۆر، کاریکـاتۆری ⬡ وابسـته بـه کاریکاتور

**caricature** /ˈkærɪkətʃʊə(r), US -tʃər, -tʃʊr/ *noun*
کاریکاتۆر، وێنەی گاڵتەجار، کاریکاتۆرکێشی، هونەری کاریکـاتۆر: *a cruel caricature of the prime minister* ◊ *The portrait verged on caricature* 2 لاسایی ⬡ 1 کاریکـاتور، هنـر کاریکاتور 2 تقلید

**caricatured** *adjective*
پێکەنینی، فڕاوی، گاڵتەجار ⬡ مضحک، مسخره

**caricaturist** *noun*
کاریکـاتۆرکێش، کاریکاتۆریسـت ⬡ کاریکاتوریست

**caries** /ˈkɛəriːz, US ˈker-/ *noun*
کرمـێ‌بـوون، ڕەش‌بوونـەوە، ڕەشـەوەبوون، دافـەوتان، ڕزیـن، خورانـەوە، پـووان (ددان یـان ئێـسک) ⬡ پوسیدگی

**carillon** /kəˈrɪljən, US ˈkærəlɑːn/ *noun*
کـاریلۆن 1 جـۆرێ زەنـگ 2 ئـاوازێ کـە بـەو زەنگە لێ‌دەدرێ ⬡ کاریلون

**carillonneur** *noun*
کاریلۆن‌ژەن ⬡ کاریلون‌نواز

**carina** /kəˈrʌɪnə, US -ˈriː-/ *noun, pl.* carinae /-niː/ or carinas
1 (ڕووەکـناسی و گیانەوەرناسی) ئێـسکەکۆلەی بەرسنگ، لۆتکە، ئەندامێکی شێوەکاریتـەی بنـی کەشتی، (تویکاری) بەش، تیغە (یان تیژایی) یـان چوکلەیێکی کاریتەئاسا، تیژایی یان تیغەیێکی شێلمان‌ئاسای keellike تویکاری یـان ڕووەکـی (وەک لیواری تیژ یان تیغەی چۆڵـەمەی سـنگی باڵندەیێ یـان (بە درێژایی) لێواری دوو پەڕەی هاوبـەش) 2 (ئـەسـتێرەوانی Carina) لۆتکـە:

کۆئەستێرەی نیوەگۆی باشووری نزیک بە خاچی باشووری Southern Cross، ئەستێرەی پرشنگداری Canopus ی تیایە (بنەرەت: لە لاتینەوە "keel") ◌ 1 زورق 2 السفینه‌الطائر

**carinal** *adjective*
سەربە ئێسکەکۆڵەی سنگ، لوتکەیی ◌ زورقی

**carinate** /'kærıneıt, US -nət/ *adjective*, also carinated
1 سەربە باڵندەیێ کە ئێسکی لوتکەیی هەبێ (بروانە ratite) 2 خاوەنی کاریتە یان شێلمانی (بنی) کەشتی ◌ کارینیت

**caring** /'keərıŋ, US 'ker-/ *adjective, noun*
*adj* بەدەنگ‌خەڵکەوەبوو، دڵسۆز، یاریدەدەر *n* هاوسۆزی، خەمخۆری ◌ *adj* نوع‌دوست، کمک‌کننده *n* هم‌دردی

**carioca** /,kærı'əʊkə/ *noun, pl.* cariocas
1 رەسەنی Rio de Janeiro 2 سەما و هەڵپەرکێیەکی برێزیلی شێوەی samba دەدا ◌ کاری‌اوکا

**cariogenic** /,ke:rıə(ʊ)'dʒenık, US ,ka-/ *adjective*
دەبێتە هۆی رزانی ددان، رزێنە، ددان‌رزێن: *cariogenic foods* ◌ کاریوژنیک

**cariole** = carriole

**cariosity** *noun*
کرمێ‌بوون، دافەوتان، رزین، رەش‌بوونەوە، خورانەوە، پووان ◌ پوسیدگی

**carious** /'keərıəs, US 'ker-/ *adjective*
رزیو، دافەوتاو، دافەتراو، کرمێ(بوو)، پو(و)او، خوراو، کلۆر، رەشەوەبوو (ئێسک یان ددان) ◌ پوسیده

**caritas** /'kærıta:s/ *noun*
مرۆڤ‌دۆست، خەڵک‌خۆشەویست، دڵسۆز (بۆ خەڵک) ◌ نوع‌دوست

**carjacker** *noun*
ماشێن‌رفێن، ماشێن‌فڕێن، رفێنەری ماشێن، ماشێن‌دز ◌ اتومبیل‌ربا

**carjacking** /'ka:dʒækıŋ, US 'ka:rdʒ-/ *noun*
ماشێن‌رفێنی، ماشێن‌دزی، فڕاندن یان رفاندنی ماشێن ◌ اتومبیل‌ربایی

**carking** *adjective*
(کۆن) نیگەرانی‌نەرەوە ◌ نگران‌کننده

**carl** *noun*
1 مرۆی خوێڕی 2 (سکاتلەند) کابرا، پیاو، کەس ◌ 1 آدم پست 2 نفر

**Carley float** /'ka:li/ *noun*
جۆری کەڵەکی تەنگەتاوی (لەسەر کەشتی‌یەکان؛ بنەرەت: لە ناوی Horace S. Carley، داهێنەری ئەمریکایی) ◌ کارلی فلوت

**carline** /'ka:lın/ *noun*, also carlin, carling
ژنی پیر، ژنی جادووباز یان جادووگەر ◌ زن مسن، ساحره

**carline thistle** /'ka:lın, US -laın/ *noun*
گیایێکی درکاوی گوڵ‌تەمەن‌درێژ [ *Carlina vulgaris* و جۆرە پێوەندی‌دارەکان] ◌ سرطلایی

**Carlist** *noun, adjective*
*n* لایەنگری دۆن کارلۆس Don Carlos و جێگرەکانی *adj* Carlist ◌ کارلیست

**carload** /'ka:ləʊd, US 'ka:rloʊd/ *noun*
پڕماشێنێ، ماشێنێ، باری ماشێنێ، پڕ واگۆنێ (سوار یان بار)، ب.ت. freight car ◌ بە اندازەی ظرفیت یک واگن یا اتومبیل

**Carlovingian** /,ka:lə(ʊ)'vındʒıən/ = Carolingian

**Carlsbad plum** /'ka:lzbad/ *noun*
هەڵووژەی دەشتەکی ◌ نوعی آلوچه

**carmagnole** *noun*
کارمەنیۆل (سەما و گۆرانی) گەلی و گۆرانی گەلی لە شۆڕشی فەرەنسەدا ناوی دەرکرد ◌ کارمنیول

**carman** /'ka:mən/ *noun, pl.* carmen
عەرابەوان ◌ کارمن

**Carmelite** /'ka:məlaıt/ *noun, adjective*
*n* رەبەن یان ژنەرەبەنی تیرەی کەرمێلی، بەدرێژایی Crusade (شەڕی خاچ‌پەرستان) *adj* سەربە کەرمێلی‌یەکان ◌ کارملی

**carminative** /'ka:mınətıv, US ka:'mınətıv/ *adjective, noun*
(دەرمانی) بارەوێن ◌ (داروی) ضد نفخ

**carmine** /'ka:maın, US 'ka:rm-/ *adjective, noun*
1 (سەربە) رەنگی سووری تۆن، پڵتەخوێنی، سووری تۆخ 2 کارماین ◌ 1 (وابسته بە) قرمز جگری 2 قرمزدانه

**carminic** *adjective*
سووی توند، سووری تۆخ ◌ قرمز جگری

**carnage** /'ka:nıdʒ, US 'ka:rn-/ *noun*
کوکوژی، کوشتوکشتار، کوشتوبڕ، کوشتن‌کاری ◌ قتل‌عام

**carnal** /'ka:nl, US 'ka:rnl/ *adjective*
1 جەستەیی، لەشی، corporeal ،bodily 2 شەهوانی، ئالۆشی، زایەندی، رەگەزی، سێکشوال: *carnal love* ،*carnal desires* 3 دنیایی: *carnal* ،temporal ؛*a carnal mind* *weapons* (بنەرەت: لە لاتینی *carnalis* کریستیەن، لە *carn-* ،*caro* "گۆشت") ◌ 1 جسمی 2 شهوانی، جنسی 3 دنیوی

**carnalist** *noun*
کەسی بەئالۆش یان شەهوانی، ئاورگرتوو ◌ شخص شهوانی

**carnality** /ka:'ælətı/ *noun, pl.* carnalities

1 جەستەیەتی، لەشێتی، لەشیبوون 2 ناڵۆشێتی، نزیکی، نیان ◌ 1 جسمانیت 2 شهوانیت، مقاربت

**carnal knowledge** *noun*

نیان، نزیکی، هاوجێیی ◌ جماع

**carnallite** /ˈkɑːn(ə)lʌɪt/ *noun*

کانێکی سوورباو یان سپی، کلۆرایدی پۆتاسیۆم یان مەنیزیۆمی تیایە (لە ناوی Rudolf von Carnall ئەندازیاری ئەڵمانی کان) ◌ کرنالیت

**carnally** /ˈkɑːnəli, US ˈkɑːrn-/ *adverb*

بەشێوەیەکی جەستەیی یان لەشی، لەشییانە ◌ به طور جسمی

**carnassial** /kɑːˈnasɪəl/ *adjective, noun*

(گیانەوەرناسی) *adj* گۆشتخۆرە: سەربە ددانی premolar ی سەروو و molar ی خوارووی گۆشتخۆرێ *n* ددانی گۆشتخۆرە (بنەڕەت: لە فەرەنسی *carnassier* "گۆشتخۆر "carnivorous + لەسەر بنچینەی *carn-* ،*caro* لاتین "گۆشت "flesh") ◌ کارناسیال

**carnassial tooth** *noun*

ددانی گۆشتخۆرە (زۆرتر بۆ برینە (یان لەتکردن) یان پچڕین) ◌ دندان کارناسیال

**Carnatic** /kɑːˈnatɪk/ *adjective*

سەربە شێوازی سەرەکی موسیقای کۆنی باشووری هیندوستان، لە موسیقای هیندوستانی باکوور جیایە ◌ کارناتیک

**carnation** /kɑːˈneɪʃn, US kɑːrˈn-/ *noun, adjective*

*n* (گوڵە) مێخەک *adj* سووری ڕۆشن یان گەش، پەمەیی، چێرەیی ◌ *n* میخک *adj* قرمز روشن

**carnauba** /kɑːˈnɔːbə, US -ˈnaʊbə/ *noun*

1 جۆرێکی fan palm باکووری ڕۆژهەڵاتی بریزیل، گەڵاکانی مۆمێکی زەردباو دەردەدەن [*Copernicia cerifera*] 2 مۆمی ئەو دارە ◌ کارنوبا

**carnauba wax** *noun*

مۆمی کارنۆبا ◌ موم کارنوبا

**carne asade** *noun*

(سپانیایی) جۆرێ چێشتی برشتەی مەکسیکی ◌ نوعی غذا

**carnelian** /kɑːˈniːliən, US kɑːrˈn-/ *noun*, also cornelian

ناقیقی سوور ◌ عقیق قرمز

**carnification** /ˌkɑːnəfɪˈkeʃn/ *noun*

گۆشتهێنان، گۆشتسازی ◌ گوشت‌سازی

**carnival** /ˈkɑːnɪvl, US ˈkɑːrn-/ *noun*

1 وەرز یان فیستیڤاڵی بەزم و شادی بەرلە Lent 2 بەزموڕەزم، ئاهەنگ، جەژن، جێژن، کاروانی شادی ◌ 1 کارناوال 2 جشن، کاروان شادی

**Carnivora** /kɑːˈnɪvərə/ *noun, pl.*

(گیانەوەرناسی) گۆش(ت)خۆران، گۆشتخۆرەکان: دەستەیێکی شیردەران mammals کە پشیلەکان، سەگەکان، ورچەکان، کەمیتارەکان، دەڵەکەکان weasels، سیڤیتەکان civets، ڕاکوونەکان و مارخۆرەکان mongooses دەگرێتەوە کە خاوەنی ددان و شەویلکەی بەهێزن (یان بەکارن) و بۆ پچڕین و خواردنی گۆشت گونجاون ◌ گوشت‌خواران

**carnivore** /ˈkɑːnɪvɔː(r), US ˈkɑːrn-/ *noun*

1 گیانەوەری گۆشتخۆر 2 (گیانەوەرناسی) گیانەوەرێ لە تیرەی Carnivora 3 ڕووەکێکی گۆشتخۆر carnivorous plant ◌ 1 حیوان گوشت‌خوار 2 کارنیوور 3 گیاه گوشت‌خوار

**carnivorous** /kɑːˈnɪvərəs, US kɑːrˈn-/ *adjective*

گۆشتخۆر، سەربە گۆشتخۆران ◌ گوشت‌خوار، وابسته به گوشت‌خوران

**carnivorous plant** *noun*

گیا یان ڕووەکی گۆشتخۆر ◌ گیاه گوشت‌خوار

**carnivorousness** /kɑːˈnɪvərəsnəs, US kɑːrˈn-/ *noun*

گۆشتخۆری ◌ گوشت‌خواری

**carnosaur** /ˈkɑːnəsɔː/ *noun*

گۆشت(مار)مێلکە: دایناسۆرێکی گۆشتخۆری کەتەی دوویێی کۆمەڵێ کە tyrannosaurus، allosaurus و megalosaurus دەگرێتەوە (بنەڕەت: لە *carn-* ،*caro* لاتین "گۆشت" + *sauros* یۆنانی "مارمێلک") ◌ کارنوسور

**carnotite** /ˈkɑːnətʌɪt/ *noun*

جۆرێ کانی تیشکدەری زەردی لیمۆیی، لە ڤاناداتی یورانیۆم، پۆتاسیۆم و تۆخم یان ڕەگەزەکانی تر پێکهاتووە $K_2(UO_2)_2(VO_4).3H_2O$ (بنەڕەت: لە ناوی ماری ئادۆلف کارنۆت Marie Adolphe *Carnot* فەرەنسی) ◌ کارنوتیت

**carob** /ˈkærəb/ *noun*

(دار) خەرنووب، پاکەمتار، مەحچە، خرنووک، حوشترخۆر [*Ceratonia siliqua*] (لە *karrūba* عەرەبییەوە) ◌ خرنوب

**carob tree** *noun*

داری خرنووک یان پاکەمتار ◌ درخت خرنوب

**carol** /ˈkærəl/ *noun*

1 سروودی کریسمەس: *a carol service* 2 سرود، گۆرانی، ستران ◌ 1 سرود کریسمس 2 ترانه، سرود

**Caroline** /ˈkarəlʌɪn/ *adjective*, also Carolean /-ˈliːən/

1 سەربە پادشایێتی چارلزی یەکەم و دووەمی ئینگلتەرە (Charles I and II ;1625-49 1660-85) 2 = Caroligian ◌ کارولین

**Carolingian** /ˌkarəˈlɪndʒɪən/ *noun, adjective*, also Carlovingian

*adj* سەربە بەرەی Frankish کە لە 750 تا 987 بەسەر ڕۆژاوای ئەوروپادا حکومەتیان کرد *n* ئەندامی بەرەی Carolingian ◌ کارولنژی

**Carolinian** /ˌkarəˈlɪniən/ *noun, adjective*
*n* خەڵکی هەریمەکانی کارلینای باکووری و باشووری *adj* سەربە کارلینای باکووری و باشووری؛ ئاماژە بەو ناوچە دارستانییەی ئۆنتاریۆی Ontario باشووری تا کارۆلینای باشووری ◌ کارولینایی

**caroller** *noun*
سرودبێژ ◌ سرودخوان

**carotenase** *noun*
(کیمیا) کارۆتیناز: هەوینەیێ کە کارۆتین دەگۆڕێ بۆ ڤیتامین A ◌ کاروتناز

**carotene** /ˈkarəti:n/ *noun*
(کیمیا) کارۆتین، گێزەرە: هەریەک لە چەند ڕەنگی هایدرۆکاربۆنی کریستالی سوور یان پرتەقاڵی (وەک $C_{40}H_{56}$) کە لە chromoplast ـەکانی ڕووەک و لە شانە چەورەکانی گیانەوەران یان پاتاڵی گیاخۆردا هەیە و دەش گۆڕدرێ بۆ ڤیتامین A ◌ کاروتن

**carotenoid** /kəˈrɒtɪnɔɪd/ *noun, adjective,* also carotinoid
هەریەک لەو چەندین جۆری ڕەنگ ب.ت. زەرد تا سوور (وەک کارۆتینەکان) کە بە زۆری لە ڕووەک و گیانەوەراندا هەیە ◌ کاروتنوئید

**carotid** /kəˈrɒtɪd/ *noun, adjective*
*n* خوێنبەری مل، کیراتید، کارۆتید *adj* سەربە خوێنبەری مل، سۆباتی ◌ *n* سرخرگ گردن، شریان شبات *adj* سباتی

**carotid artery** *noun*
خوێنبەری مل ◌ سرخرگ گردن

**carotid sinus** *noun*
بۆشایی یان سینوسی کارۆتید: بۆشاییێ کە لە گەورەبوونەوە یان کشانی بەشی نزیکی خوێنبەری کارۆتیدی سەرەکی پێکدێ ◌ جیب سبات، سینوس کاروتید

**carouse** /kəˈraʊz/ *noun*
بادەخۆری، مەیخۆری، خواردنەوە، ڕابواردن -using ؛carouser *n* ؛carousal /kəˈraʊzl/ *n*)
*n*) ◌ میگساری، بادەنوشی

**carousel** /ˌkærəˈsel/ *noun*
1 merry-goround = 2 تاسەی ڕاگوێستن، کەریسێل ◌ غلتک بار

**-carp** *suffix*
پاشگر: 1 بەر، میوە: 2 *schizocarp* بەشێ لە میوە یان بەر: *mesocarp* (بنەڕەت: لە *karpos* یۆنانییەوە "fruit") ◌ پسوند: 1 ثمرە 2 قسمتی از میوە

**carp** /kɑ:p, US kɑ:rp/ *noun, pl.* same
ماسی کەپوور [*Cyprinus carpio*] و جۆرەکانی تر، خێزان [Cyprinidae] (بنەڕەت: لە *carpe* فەرەنسی، لە *carpa* late Latin) ◌ ماهی کپور

**carpaccio** /kɑ:ˈpatʃɪəʊ, Italian karˈpattʃo/ *noun*
کارپاچیۆ: جۆرێ بەرکولی hors d'oeuvre ئیتالیایی کە لە توێی ناسکی گۆشتی ولاخ یان ماسی و سۆس پێکهاتووە (بنەڕەت: ئیتالیایی: لە ناوی وێنەکێش *Carpaccio* Vittore (ڕەنگی سووری بەکارهێنراو شێوەی گۆشتی سوور دەدا) ◌ کارپاچیو

**carpal** /ˈkɑ:pl, US ˈkɑ:rpl/ *adjective, noun*
(گیانەوەرناسی و توێکاری) *adj* مەچەکی، سەربە مەچەک *n* ئێسکی مەچەک ◌ *adj* وابستە بە مچ *n* استخوان مچ دست

**carpale** *noun*
(توێکاری) ئێسکی مەچەک ◌ استخوان مچ

**carpal tunnel syndrome** *noun*
کۆنیشانەی تونێلی مەچەک(ی): دۆخێ کە بەهۆی گوشار و پەستانی نێرڤەوە تووش دەبێ و ب.ت. لە نیشانەکانی لاوازی، ژان و تێکچوونی هەستپێکردن لە دەست و پەنجەکانە ◌ کارپال تونل سیندروم

**car park** *noun*
پارکینگ، شوێنی ڕاگرتنی ماشێن، ڕاگرتنگا ◌ پارکینگ

**carpel** /ˈkɑ:pl, US ˈkɑ:rpl/ *noun*
(زیندەناسی) نێرک، ئەندامی مێیینەی گوڵ، بەشێ لە گوڵ (یان ڕووەک) کە تۆوی تیا بەرهەم دێ (carpellary *adj*: نێرکی، سەربە ئەندامی مێیینەی گوڵ، نێرکەیی، پێوەندی بە نێرکەوە هەیە) ◌ برچە

**carpenter** /ˈkɑ:pəntə(r), US ˈkɑ:rp-/ *noun*
دارتاش، مەرەنگۆز ◌ نجار، درودگر

**carpenter ant** *noun*
مێرووڵەی دارتاش یان داربڕ [تۆوخم *Camponotus*] ◌ نوعی مورچە

**carpenter bee** *noun*
هەنگی دارتاش یا داربڕ [تۆوخم *Xylocopa*] ◌ نوعی زنبور عسل

**carpentry** /ˈkɑ:pəntri, US ˈkɑ:rp-/ *noun*
دارتاشی، مەرەنگۆزەی، نەجاری ◌ نجاری، درودگری

**carper** /ˈkɑ:pə(r)/ *noun*
ئیرادگر، عەیبگر، بەئیراد، بەعەیب ◌ خردەگیر

**carpet** /ˈkɑ:pɪt, US ˈkɑ:rpɪt/ *noun*
1 فەرش، مافوور: *a roll of carpet* 2 قالی، بەڕە، گەوە، ڕایەخ، ژێرەخەرە: *a bedroom carpet* 3 مووکێت 4 ڕایەخ، فەرش، ڕوو یان توێیێ (ئەستوور و نەرم) شتێ: *a carpet of snow* (کەنارە، سەرەناز، لاکێش side carpet)

۞ 1 فرش 2 قالی 3 موکت 4 فرش، مفروش

**carpetbag** /ˈkɑːpɪtbæg/ *noun*
خورجین یان تێری لە فەرش، تێری فەرشی ۞ خورجین فرشی

**carpetbagger** /ˈkɑːpɪtbægə(r), US ˈkɑːrp-/ *noun*
(تاپەسەند) کارپێتبەگێر، ڕێبواری خورجینی، ڕامیاری یان سیاسەتوانی خورجینی (کەسێ لە ئەیالەتەکانی سەرووی ئەمریکاوە کە چووە بۆ ئەیالەتەکانی باشوور پاش شەڕی نێوخۆیی بەمەبەستی بەدەس‌هێنانی پارە یان دەسەڵاتی ڕامیاری) ۞ کارپت‌باگر، سیاست‌مدار وارداتی

**carpet beetle** *noun*
جۆرێ قالۆنچەی چکۆلە کە کرمۆکەکانی مێملی شتی لەخوری و پارچە و شتی وان [تۆخمەکانی *Anthrenus* و *Attagenus*] ۞ نوعی سوسک

**carpet-bombimg** *noun*
بۆمبارانی خەست یان چڕوپڕ ۞ بمباران فشرده

**carpeting** /ˈkɑːpɪtɪŋ, US ˈkɑːrp-/ *noun*
1 فەرش، مافوور 2 مووکێت 3 مەتریالی دروس‌کردنی مافوور، خاوە و فڕیت، فەرشە ۞ 1 فرش 2 موکت 3 مواد فرش‌سازی

**carpet loom** *noun*
داری تەون، دەزگای تەون یان فەرش ۞ دار قالی‌بافی

**carpet shark** *noun*
جۆرێ شارک یا کۆسەی چکۆلەی تەنکاوەکانی ناوچەی هیند و پاسیفیک کە نەخشێکی ڕەنگی بەرچاوی هەیە [خێزان Orectolobidae: گەلێ جۆرن] ۞ نوعی کوسه

**carpet slippers** *noun, pl.*
سەرپێیی، سەرپایی (لەسەر فەرش پێی دەڕۆن) ۞ دمپایی

**carpet sweeper** *noun*
فەرش‌سڕ، مافوورسڕ، دەزگای سڕینی فەرش ۞ ابزار فرش‌پاک‌کنی

**carpet-weaver** *noun*
تەونکار، فەرشچن، تەونگەر، تەونچی (carpet-weaving *n*: تەونکاری، فەرشچنی، تەونگەری، تەونچێتی) ۞ قالی‌باف

**carpetweed** *noun*
گیابەرە، گیارایەخ: جۆرێ (گیای) بژاری تەرزفڕێدەر prostrate، بە گەڵای لوول و گوڵی سپی‌باو، لە خێزانی Aizoaceae، carpetweed family [*Mollugo verticillata*] ۞ نوعی علف هرز

**carpetweed family** *noun*
خێزانی گیابەرە، خێزانی Aizoaceae، هی ڕووەکی نێوپڕی بیابانن، گوڵەکانی ئەستێرەئاسان و گەڵاکۆشتێن کە جاروبار شێوەی بەردیش دەدەن: گیابەرەکان، fig marigold و ice plant دەگرێتەوە ۞ خانواده‌ی علف‌های هرز

**car phone** *noun*
تەلەفۆنی ڕادیۆیی بۆ بەکارهێنان لەنێو ماشێن‌دا ۞ کارفون

**carpogonial** *adjective*
سەربە بەردان یا بەردێن ۞ وابسته به کارپوگونیوم

**carpogonium** *noun, pl.* carpogonia
بەردان، بەردێن: ئەندامی ڕەگەزی یەک‌خانەیی هێندێ قەوزەی سوور (کە تووی گیا لەوێ دایە)، بەشی تووهێنەری ئەندامی زاوزێی مێ لە هێندێ thallophyte دا (وەک قەوزەی سوور)، دەزگا سازکەری خانە ڕەگەزی‌یەکانی قەوزە سوورەکان ۞ کارپوگونیوم

**carpology** /kɑːˈpɒlədʒi/ *noun*
لێکۆڵینەوە لەبارەی میوە و دان یا توو، میوەناسی (carpological *adj*: سەربە کارپۆلۆژی، سەربە میوەناسی) ۞ کارپولوژی

**carpool** /ˈkɑːpuːl, US ˈkɑːr-/ *noun*
بە نۆبە سوار ماشێنێ بوون (خاوەنانی ماشێنەکان و هەر بە ماشێنیکیش) ۞ هم‌پیمایی

**carpophagous** *adjective*
میوەخۆر، بەرخۆر: لە تایبەتمەندی ئەو گیانەوەرانەی کە لە توو و بەر و میوەکان دەخۆن، وەک هێندێ لە مێروو، باڵندە و شیردەران ۞ میوه‌خوار

**carpophore** /ˈkɑːpə(ʊ)fɔː/ *noun*
(ڕووەک‌ناسی) میوەهەڵگر، بەرهەڵگر 1 (لە کەڕووەکان‌دا) قەد یان لاسکی توو، ئەندامی بەرهێنەری کەڕوو یان کارگە بەرزەکان، بەرهەڵگر 2 (لە گوڵەکان‌دا) درێژەوەبوونەوەی تەوەری گوڵی کە نێرکەکان (ئەندامی مێیینەی گوڵ carpel) هەڵدەگرێ، وەک لە گوڵەکانی سەربە خێزانی parsley، تەوەری درێژەوەبوو کە لاسک یان قەدی نێرک pistil لەژوور نێرەک stamen ڕادەگرێ ۞ کارپوفور

**carport** /ˈkɑːpɔːt, US ˈkɑːrpɔːrt/ *noun*
سێبەر (ماشێن لەژێر ڕاگرتن، لەپاڵ خانوودا ساز دەکرێ) ۞ سایبان

**carpospore** *noun*
سپۆری دووانەی قەوزەی سوور، سپۆری ناجووڵۆکی nonmotile (یان ناجمۆک) قەوزە سوورەکان ۞ کارپواسپور

**carposporic** *adjective*
سەربە سپۆری دووانەی قەوزەی سوور، سەربە سپۆری ناجووڵۆکی nonmotile قەوزە سوورەکان ۞ وابسته به کارپواسپور

**-carpous** *suffix*
پاشگر: بەردار، خاوەنی بەر یان میوە، میوەدار، ئەندامە یان نێرکە بەرهێنەرەکان، خاوەنی جۆرێ بەر یان میوە ۞ پسوند: میوه‌دار، کارپوس

**carpus** /ˈkɑːpəs/ *noun, pl.* carpi /-pʌɪ/

مەچەک، ئێسکەکانی مەچەک (بنەڕەت: لە لاتینی نوێ، لە *karpos* یۆنانییەوە "مەچەک wrist") ۞ مچ، استخوان‌های مچ

**carr** *noun*

1 (ژینگەناسی) دارستانی زنە، بە داربی وئالدێر alder تەنرابێ 2 دەوەنستان 3 (بریتانیا) زۆنگەلان (بە ناوی سروشتییەوە) ۞ کار

**carrack** /'karək/ *noun*

کاراک، کەراک، کەشتی چارۆکەدار، بازۆ (کەشتییێکی گەورەی بازرگانی ولاتانی مەدیتەرانە، هی سەدەکانی 14 تا 16) ۞ کراک

**carrageen** /'karəgi:n/ *noun*, also carragheen or carrageen moss

قەوزەی دەریایی، کەراجین [Chondrus crispus] ۞ کراجین

**carrageenan** /ˌkarə'gi:nən/ *noun*, also carrageenin

ماکێکی ملی colloidal substance کە لە چەندین جۆر قەوزەی سوور دەگیرێ (وەک Irish moss)، وەک stabilizing ۞ کراجینان

**carrefour** *noun*

1 گۆڕەپان، مەیدان، market-place 2 - crossroads ۞ میدان

**carrel** /'kærəl/ *noun*

ژوورۆچکە، ژوورچە (کتێبخانە) ۞ حجرک

**carriage** /'kærɪdʒ/ *noun*

1 واگۆن، کالیسکە، عەرەبانە، گەردوونە 2 هەلگرتن، بردن، راگوێستن، گوێزانەوە 3 بارانە، کرێبار 4 باری جەستەیی، راوێستان و هتد. جوولانی بەشێ لە دەزگایێ کە لە بەشەکانی تریش پشتیوانی دەکا یان دەجوولێنێ 5 جێبەجێکردن، راپەڕاندن، کردن 6 بەشی جوولۆکی دەزگای نووسین ۞ 1 واگن، کالسکە 2 حمل‌ونقل، حمل 3 کرایەی بار 4 وضع بدن، هیأت 5 کاریج 6 ناقل

**carriageable** /'kærɪdʒəbəl/ *adjective*

ریگای کالیسکە، گالیسکەڕەو، کالیسکەڕەو، عەرەبانەڕەو ۞ درشکەرو

**carriage and pair** *noun*

کالیسکە یان عەرەبانەی دووئەسپە ۞ کالسکەی دواسبە

**carriage dog** *noun*

(کۆن) سەگی Dalmatian ۞ سگ دالماسیا

**carriage house** = mews house

**carriageway** /'kærɪdʒweɪ/ *noun*

1 رێ، رێگا، رێگای شۆستە، ماشێنڕەو 2 لایەکی پانەڕێ، بەر یان لایەکی رێگای دابەش‌کراو ۞ 1 جادە، سوارەرو 2 یک سمت اتوبان

**carrick bend** *noun*

جۆێ گرێ (بۆ گرێدانی تەناف و گوریسی کەشتی) ۞ گرە بافندە

**carrier** /'kæriə(r)/ *noun*

1 هەلگر، کۆلکێش 2 کۆمپانی گوێزانەوە، ناوکۆیی راگوێستن 3 راگوێزەر (نەخۆشی) 4 نامەبەر، ـهەلگر، ـبەر 5 کەشتی فڕۆکەهەلگر 6 (دووچەرخە) پاشتەرک 7 (ماشێن) باربەست، باربەند، کەل‌وپەل‌هەلگر ۞ 1 حامل، برندە 2 شرکت حمل‌ونقل 3 ناقل (بیماری) 4 پیک، ـبر 5 ناو هواپیمابر 6 ترک‌بند (دوچرخە) 7 باربند

**carrier bag** *noun*

توورەکەی نامەبەر، دەلق، ساکی کرین ۞ ساک

**carrier pigeon** *noun*

کۆتری نامەبەر ۞ کبوتر قاصد

**carrier gas** *noun*

(کیمیا) گازی هەلگر ۞ گاز حامل

**carrier wave** *noun*

شەپۆلی هەلگر ۞ موج حامل

**carriole** /'karɪəʊl/ *noun*, also cariole

1 جۆرێ کالیسکەی چکۆلانە یان سووکی یەک‌ئەسپە 2 (لە کەنەدا) جۆرێ خێشک کە سەگ یان ئەسپ دەیکێشێ، و جێگایێکیشی بۆ یەک یان دوو سوار هەیە، خێشکی سووک ۞ کاریول

**carrion** /'kæriən/ *noun*

لاشە، کەلاک، لاک، جەندەک، کەلەخ ۞ مردار

**carrion beetle** *noun*

قالۆنچەی کەلاک‌خۆرە [Silphidae: زۆر جۆرن] ۞ نوعی سوسک

**carrion crow** *noun*

(بالندەناسی) قەلەڕەشەی ئاسایی، قەلەڕەشکەی کەلاک‌خۆر [*Corvus corone*] ۞ کلاغ ابلق

**carronade** /ˌkarə'neɪd/ *noun*

(مێژوویی) تۆپێکی کورتی کالیبرگەورە، زۆرتر لە هێزی دەریاییدا بەکاردێنرا (بنەڕەت: لە ناوی *Carron* نزیک بە فالکیرک Falkirkی سکاتلەند، جێگایێ کە ئەم جۆرە تۆپە بۆ یەکەم جار ساز کرا) ۞ کاروناد

**carrot** /'kærət/ *noun*

1 گێزەر، یارکۆک [*Daucus carota*] 2 بنەگێزەر، بنجی گێزەر 3 خەلات، پاداشت (بنەڕەت: لە *karōton* یۆنانی) ۞ 1 هویج 3 بتەی هویج 3 پاداش

**carroty** /'kærəti/ *adjective*

(رەنگ) پرتەقالی رۆشن (یان گەش)، زەردی مەیلەو سوور، پرتەقالی: *carroty hair* ۞ زرد مایل بە قرمز

**carrousel** = cariusel

**carry** /'kæri/ *noun*, *pl.* carries

1 مەودا، تیراوێژ، ماوەبڕ 2 تفەنگ‌سەرشان ۞ 1 تیررس 2 دوش‌فنگ

**carry-all** = holdall

**carrycot** /'kærikɒt, US -kɑ:t/ *noun*

سەبەتەی منال، ساکی منال ◌ ساک بچه

**carrying charge** *noun*

سوودی کرینی پاژی یان بەپاژ، بەهرە و سوودی کرینی قیستی ◌ بهره‌ی خرید قسطی

**carryings-on** *noun*

جەنجالی، ئاژاوە، کێشەوهەرا، زاوە، کەربازاری ◌ جنجال، الم‌شنگه

**carry-on** *noun, adjective*

*n* جەنجالی، ئاژاوە: *adj What a carry-on!* ساک یا جانتا (دەستی)ی سوار، جانتای ریبوار: *carry-on baggage* ◌ *n* جنجال *adj* ساک مسافر

**carry-out** = take away

**carry-over** *noun*

1 راگوێزراو (لە ژمێریاری‌دا) 2 سەرباقی، پاشماوە 3 راگوێستن ◌ 1 منقول 2 باقی‌مانده 3 انتقال

**carse** /ka:s/ *noun*

(سکاتلەند) دەشتی پاڵ چۆمێ ◌ کارس

**car sea** *noun*

1 سەندەڵی یان کورسی ماشێن 2 سەندەڵی یان کورسی منال ◌ 1 صندلی ماشین 2 صندلی بچه

**carsick** /'ka:sɪk, US 'ka:rsɪk/ *noun*

دڵێکاهاتوو (لە نێوماشێن؛ *carsickness n*) ◌ دچار ماشین‌گرفتگی شده

**cart** /ka:t, US ka:rt/ *noun*

گاریە، هێلی، هێلینگە (چوارچەرخ)، داشقە، فەرغوون، عەرابە، دەستەبەر: *a horse and cart ◊ a serving cart* ◌ گاری، گاری دستی

**cartage** /ka:tɪdʒ/ *noun*

هەڵگرتن بە گاریە، بە داشقە بردنەوە، کرێ داشقە ◌ کارتاژ

**carte blanche** /ˌka:t 'bla:nʃ, US ˌka:rt/ *noun*

1 (فەرەنسی) ئازادی یان دەسەڵاتی تەواو یان رەبەق 2 کاغز یان کارتی سپی ◌ 1 اختیار تام 2 کارت یا کاغذ سفید

**carte de visite** /ˌka:t də vɪ'zi:t/ *noun*

1 کارتی ڤیزیت 2 وێنەی 8,89 لە 5,715 سانتی‌میتر ◌ کارت ویزیت

**cartel** /ka:'tel, US ka:r'tel/ *noun*

(ئابووری) کارتێل ◌ کارتل

**carter** /'ka:te(r)/ *noun*

داشقەچی، گاریەچی، گاریەوان ◌ گاری‌ران

**cartful** /'ka:tfʊl/ *noun, pl.* cartfuls

پڕ داشقەیێ، داشقەیێ ◌ گنجایش یک گاری

**Cartesian** /ka:'ti:zɪən, US -ʒ(ə)n/ *adjective, noun*

*adj* سەربە فیلسووفی فەرەنسی رێنێ دیکارت René Descartes (1596-1650) و بیروباوەری *n* لایەنگری دیکارت ◌ دکارتی

**Cartesianism** *noun*

دیکارت‌گەری، دیکارت‌باوەری ◌ دکارت‌گرایی

**Carthaginin** /ka:θə'dʒɪnɪən/ *noun, adjective*

*n* رەسەن یان دانیشتووی شاری کۆنی Carthage لە کەناری ئەفریکای باکووری *adj* سەربە کارتاژ یان خەڵکەکەی ◌ کارتاژی

**Carthusian** /ka:'θju:zɪən/ *noun, adjective*

*n* رەبەن یان ژنەرەبەنی تیرەیێ کە لە لایەن سەینت Bruno لە 1084 دامەزرا *adj* سەربەو تیرەیە ◌ کارتوزین

**carthorse** /'ka:thɔ:s, US 'ka:rthɔ:rs/ *noun*

بارگین، پالانی ◌ یابو

**cartilage** /'ka:tɪlɪdʒ, US 'ka:rt-/ *noun*

کرکراگە، کرۆژە، خرمووکە، خرمووچک، چەق، رەقێنە ◌ غضروف

**cartilaginoid** /-'ladʒɪnɔɪd/ *adjective*

کرکراگەیی، کرۆژەیی، کرۆژەئاسا ◌ غضروفی، غضروف‌مانند

**cartilaginous** /ˌka:tɪ'lædʒɪnəs, US ˌka:rt-/ *adjective*

کرکراگەیی، کرکراگەدار، کرۆژەیی، کرۆژەدار، کرۆژەئاسا ◌ غضروفی

**cartilaginous fish** *noun*

کرۆژەماسی، ماسی کرکراگەیی (لە جیاتی ئێسک کرۆژەی هەیە [پۆل Chondrichthyes]) ◌ ماهی غضروفی

**cartload** /'ka:tləʊd, US 'ka:rtloʊd/ *noun*

1 (پڕ)داشقەیێ 2 برێکی زۆر ◌ 1 به اندازه‌ی بار یک گاری 2 مقدار زیاد

**cartogram** /'ka:təgram/ *noun*

کارتۆگرام، نەخشەی زانیاری سەرزمێری کە بە شێوەی هێڵکاری یان دیاگراماتیک پیشان دەدرێ ◌ کارتوگرام

**cartographer** /ka:'tɒgrəfə(r), US ka:r'ta:g-/ *noun*

نەخشەکێش ◌ نقشه‌کش

**cartographic** /ˌka:tə'græfɪk, US ˌka:rt-/ *adjective*, also cartographical

سەربە نەخشەکێشی (*cartographically adv*) ◌ وابسته به نقشه‌کشی

**cartography** /ka:'tɒgrəfi, US ka:r'ta:g-/ *noun*

نەخشەکێشی، هونەر یان زانستی کێشانەوەی نەخشەکان ◌ نقشه‌کشی

**carton** /'ka:tn, US 'ka:rtn/ *noun*

کارتۆن، قوتوی مقەبایی، قوتو، بەستە: *a milk carton/a carton of milk ◊ a carton of cigarettes* ◌ کارتن، جعبه

**cartoon** /ka:'tu:n, US ka:r't-/ *noun*

1 کاریکاتور 2 کارتۆن: *a Walt Disney cartoon* 3 نەخشە (تەون، تاپێستری و هتد،

cartoony ؛cartoonish *adj* ؛cartooning *n* (*adj* ◌ 1 کاریکاتور 2 کارتون 3 نقشە

**cartoonist** /kɑːˈtuːnɪst, US kɑːrˈt-/ *noun*
کاریکـــــاتورکێش، کاریکاتوریـــــــــت ◌ کاریکاتوریست

**cartouche** /kɑːˈtuːʃ/ *noun*, also cartouch
1 گوللەتوپ 2 چێوە یان چوارچێوەی جوانی (بـە دەوری نـەخـش یـان نووسـراوەیــی) 3 (شـوێنەوارناسـی) شێوەیێکی لاکێشەیی یان هێلکەیی هێلی وێنەیی hieroglyph میـری کە نـاوی فیرعـەون یـان پاتـشایێکی تیایـە ◌ 1 گلولەی توپ 2 قاب تزئینی 3 کارتوش، قاب کتیبە

**cartridge** /ˈkɑːtrɪdʒ, US ˈkɑːrt-/ *noun*
1 فیـشەک، گوللـە 2 نیـوە، نیـوک 3 کـارتریج، کاسێت 4 سەری پیکاپ، جێگای دەرزی (قەوان) ◌ 1 فشنگ 2 تویی 3 کاست 4 سر پیکاپ

**cartridge belt** *noun*
رەخـت، فیـشەکبەنـد، فیـشەکدان، خەریتـە ◌ فانوسقە، نوار فشنگ

**cartridge brass** *noun*
(کانزاناسی) زەردی فیشەک ◌ برنج فشنگ

**cartridge case** *noun*
قاپور، قاوغ، قەوان، قابلۆخ ◌ پوکە

**cartridge clip** *noun*
فیـشەکدان، خەریتـە، جـێ‌فیـشەک، گوللـەدان، ساجوور، دەراغ، خەشاب ◌ خشاب

**cartridge paper** *noun*
کاغزی کێشانەوە یان وێنەکێشی ◌ کاغذ فیلی

**cart-road** *noun*
ڕێگای خاکی، کوێرەڕێ ◌ جادەی خاکی

**cart-track** *noun*
ڕێگـای خـاکی، کـوێرەڕێ، ڕێگـای نـاخۆش ◌ جادەی خاکی، کورەراه

**cartwheel** /ˈkɑːtwiːl, US ˈkɑːrt-/ *noun*
1 مەحەلـەق، خۆهەڵـگێرانەوە 2 چـەرخ یـان پێچکە یان تایەی داشقە، ڕەوڕەوەی داشقە ◌ 1 چرخ‌وفلک 2 چرخ گاری

**cartwright** /ˈkɑːtraɪt/ *noun*
عەرابەساز، داشقەچی، داشقەگەر، داشقەساز ◌ گاری‌ساز

**caruncle** /ˈkarəŋk(ə)l, US kəˈrʌŋ-/ *noun*
(گیانـەوەرناسـی و ڕووەکناسـی) گۆشـتە، زیدەگۆشـت، گۆشـتپـارە، پۆپـە (کەڵەشـێر؛ بنەڕەت: لە *caruncula* لاتین، لە *caro*، *carn-* "گۆشت") ◌ لحیمە

**carunclular** /kəˈrʌŋkjələ(r)/ *adjective*
گۆشـتەیی، سەربە زیدەگۆشت یـان گۆشتپارە ◌ وابستە بە لحیمە

**carunclate** /kæˈrʌŋkjəlɪt/ *adjective*, also carunclated
زیدەگۆشتدار، گۆشتپارەدار ◌ دارای لحیمە

**carved** *adjective*
هەڵکەنراو، هەڵکۆڵراو ◌ کندەکاری‌شدە

**carvel** /ˈkɑːv(ə)l/ = caravel

**carver** /ˈkɑːvə(r)/ *noun*
1 هەڵـــکۆڵ، داتـــاش، تاشـــینگەر، تاشـــەر 2 پەیکەرتاش 3 بەردتاش 4 کاردی گۆشت ◌ 1 کندەکار 2 پیکرتراش 3 سنگ‌تراش 4 کارد گوشت

**carving** /ˈkɑːvɪŋ, US ˈkɑːrvɪŋ/ *noun*
1 پەیکـەری جـوانی 2 هەڵکۆڵـین، کـاردوۆزە، دارتاشـی، تاشـینگەری: *There is some fine carving on the facade* 3 پەیکەرتاشی 4 بەردتاشـی ◌ 1 مجسمەی تزیینی 2 کندەکـاری 3 پیکرتراشی 4 سنگ‌تراشی

**carving fork** *noun*
چنگاڵی گۆشت ◌ چنگال گوشت

**carving knife** *noun*
کارد یا کێردی گۆشت، گۆشتبڕ ◌ کارد گوشت

**car wash** *noun*
ماشێن‌شۆری، کارواش ◌ کارواش

**cary(o)-** *prefixf*
پێشگر: نێوک یـان نـاوکی خانـە (بنـەڕەت: لە *karuon* یۆنانی‌یەوە "nut") ◌ پیشوند: هستەی سلول

**caryatid** /ˌkæriˈætɪd/ *noun*, *pl.* caryatides /-diːz/ or caryatids
(مێعمـاری) کاریاتیـد، کوڵـەکەی ژنپەیکـەر، ژنەستوون (بنەڕەت: لە *caryatides* لاتینـەوە، لە *karuatides* یۆنـانی‌یـەوە، کـۆی *karuatis* "قەشەژنی ئارتێمس Artemis لە Caryae"، لە *Karuai* (Caryae) لە لاکۆنیا Laconia) ◌ ستون زن‌پیکر

**caryophyllaceous** /ˌkarɪə(ʊ)fɪˈleɪʃəs/ *adjective*
(ڕووەکناسـی) سـەربە تـیرەی مێخـەکی یـان پەمـــەیی (Caryophyllaceae)، مێخـــەکیان، تیرەمێخەکی ◌ قرنفلی

**caryopsis** /ˌkarɪˈɒpsɪs/ *noun*, *pl.* caryopses /-siːz/ or caryopsides
(ڕووەکناسـی) نـاوکڕواڵـەت، نـاوکڕوو، نـاوکنمـوود، کاریناپـسیس، کاریۆپـسیس (دانەوێڵەی یەکدەنکی؛ بنەڕەت: لە لاتینی نوێ، لـە *karuon* یۆنـانی "نـاوک "nut + *opsis* "ڕواڵەت، نموود "appearance) ◌ کاریوپسیس

**casa** *noun*
ماڵ، خانوو ◌ منزل، خانە

**Casanova** /ˌkæsəˈnəʊvə, ˌkæzə-, US -ˈnoʊvə/ *noun*
کەسینۆڤی، پیاوێ کە چەندین دلـداری هـەبێ، lover (بنەڕەت: لە ناوی Giovanni Jacopo *Casanova* (1725–98)، پیـاوی جـەربـەزەی ئیتالیایی adventurer) ◌ کازانوا

**casbah** = kasbah

**cascabel** /'kaskəb(ə)l/ *noun*
1 جـۆرێ بیبارەســوورەی ورد 2 دەرپـەڕیـوی پـشتەوە یـان دواوەی تۆپـە سـەرپـڕە muzzle-loading کۆنەکان ۞ کاسکابل

**cascade** /kæ'skeɪd/ *noun*
1 نیمچەتافـگە، نیمچـەڕێژاو، ڕێـزاوک، زنجـیرە یان ڕیزەتاڤگەی چکۆلە 2 (جل‌وبەرگ) چـین 3 هەرەمە ۞ 1 آبشاره 2 موج 3 کاسکاد

**cascara** /kas'kɑːrə/ *noun*, also cascara sagrada /sə'grɑːdə/
1 تویکلەپیرۆزە، کەسـکارا (دەرمـانێکی ڕەوانی کە لە تویکلی داریکی ئەمریکایی سـاز دەبێ) 2 داری تویکلەپیرۆزە [*Rhamnus purshiana*] (بنـەڕەت: لـە *cáscara (sagrada)* سـپانیایی "(sacred) bark") ۞ کاسکارا

**case**[1] /keɪs/ *noun*
1 بابەت، کەیس، نموونە، ویّنە، میناک 2 کـەیس یان بابەتی نەخۆشی، ئینستەنـسی نەخۆشی: *a severe case of typhoid* 3 ئەنگاوتە، بەرکەوت، نـەخۆش، ناسـاز 4 کـرده، کـار 5 چۆنیـەتی 6 پرس، کیشە، دۆز، پرسـگرێک، بابەت، مژار: *a murder case* 7 دۆخ، بـار، بـارودۆخ، ڕەوش، کـاودان 8 داواکـاری 9 بەلـگەکان، بەلـگە، شایەت، بەلـگەهێنانەوە 10 ڕاستی، بوویـەر 11 مەتـەڵ، ڕاز 12 (ڕێزمـان) دۆخ (= شـێوەی نـاو، ئاوەڵناو یا بریناو کە پێوەندی واتایی semantic relation وشـەکـان بـۆ وشـەکـانی تـری ڕسـتە دەردەبڕێ): ◊ *the accusative/genitive case* 13 (نافـەرمی) کـەس، پیاو، مرۆ: *He's a hopeless case* (بنـەڕەت: لـە *cas* فـەرەنـسی کـۆن، لـە *casus* لاتـین "کـەوتـن "fall"، پێوەندی بە *cadere* هەیە "کەوت") ۞ 1 مورد، مثال 2 مورد بیماری 3 بیمار 4 امر 5 کیفیت 6 مسأله، قضیه، موضوع 7 وضع، وضعیت 8 دعوا (ی حقوقی) 9 شواهد، مدرک، ادله 10 حقیقت 11 معما 12 (دستور زبان) حالت 13 آدم

**case**[2] /keɪs/ *noun*
1 قوتو، سنووق، یەغدان، سیپ، مجری، جانتا، تووڕەکە، جزدان، جامەدان: *a jewellery case* 2 بەرگ، کیف، ڕووپۆش، تویکڵ، تویخ 3 قـاوغ، قـاپوور 4 چوارچێـوە (درگـا و پـەنجیرە) ۞ 1 جعبه، کیف، کیسه، چمدان 2 جلد، پوسـت، غـلاف 3 پوکه 4 چهارچوب

**case analysis** *noun*
شـیکردنـەوەی ڕەوش یـان بـارودۆخ، دۆخ‌شیکاری ۞ تحلیل وضع

**caseation** /ˌkeɪsɪ'eɪʃ(ə)n/ *noun*
(پزشـکی) پـەنیرە (بنـەڕەت: لـە *caseatio(n-)* لاتینی سەدەکانی نێوەڕاست، لە *caseus* ـەوە "پەنیر") ۞ نوعی بیماری

**casebook** /'keɪsbʊk/ *noun*
پێـشینە، کـەیس‌نامـە، بابـەت‌نامـە، تۆمـارەی کێشەکان یان بابەتەکان ۞ سوابق، کتاب موارد

**case-bottle** *noun*
شووشەی چوارپاڵوو یان چوارلا ۞ چاربر

**case-bound** *adjective*
(کتێب) بەرگ‌ڕەق، ڕەقپۆش ۞ زرکوب

**cased** /keɪst/ *adjective*
تـەواو داپۆشـراو (بـە مـادە یـان مەتریاڵـێکی تایبـەتی): *The towers are made of steel cased in granite* ۞ کاملاً پوشیده

**case grammar** *noun*
ڕێزمانی دۆخ (= شێوە و تێڕوانینە لە ڕێزمان کە پێداگیری لەسـەر پێوەندی واتایی semantic relationship نێـو ڕسـتە دەکـا و لـە کۆتـایی شەستەکاندا لە لایەن سی جەی فیلمۆر C. J. Fillmore پەرەی پێدرا. چەند بەشێ لە ڕێزمـانی دۆخ لـە فـێرژنی نـوێ‌تـری ڕێزمـانی زایـادا generative grammar تـێ‌خـراوە) ۞ دسـتور حالت

**case-hardened** *adjective*
ڕەقـاو، زاخـاودراو، ئـاودراو، خـاراو، بەئەزموون ۞ آبدیده

**case history** *noun*
سەربردە، ژیان‌نامە ۞ شرح حال

**casein** /'keɪsiːn, US -sɪɪn/ *noun*
پەنیرین، پەنیرک، کەیسین (= پرۆتێینێکی نێو شیر و بنچینەی پەنیر دادەمەزرێنێ، بنەڕەت: لە *caseus* لاتین "پەنیر") ۞ کازئین

**case knife** *noun*
(کـۆن) جـۆرێ خـەنجێری daggerی کـالان‌دار ۞ نوعی دشنه

**case law** *noun*
1 ڕەوتی قانوونی 2 قانوون یان زاکوونی دانراو ۞ 1 رویەی قضایی 2 قانون بدعتی

**case-load** /'keɪsləʊd, US -loud/ *noun*
ژمارەی نەخۆشـەکان (هی دوکتورێ)، ژمـارەی کەیسەکان ۞ تعداد بیماران یا پروندەها

**casemate** /'keɪsmeɪt/ *noun*
جێ‌پەنای تۆپ، پەناتۆپ ۞ پناهگاه توپ

**casement** /'keɪsmənt/ *noun*
1 پـەنجێرەی لاولاوەدار، دوودەری، ئاڤـدا، پەنجێرەی درگایی (وەکوو درگا دەکرێتەوە) 2 پەنجێرە، بەرکاز، چوارچێوە 3 قـاوغ، ڕووپۆشە، بـەرگ ۞ 1 پنجـرەی لـولادار 2 پنجـره، قـاب 3 پوشش

**casement window** *noun*
پەنجێرەی لاولاوەدار یا درگایی ۞ پنجرەی لولادار

**caseous** /'keɪsɪəs/ *adjective*
(پزشـکی) پـەنیری، پەنیرئاسـا، شـێوەپەنیر، لەپەنیرچوو ۞ پنیری، پنیرمانند

**casern** /'kə'zɜ:n/ *noun*, also caserne
ســـەربازخانە، ســـپاخانە (بنـــەڕەت: *caserne* فەرەنسی) ۞ پادگان

**case-sensitive** *adjective*
(کـــامپیوتێر) جیاکـــەرەوەی پیتـــە گـــەورە و چکۆلەکان ۞ کیس سنسیتیو

**case-shot** *noun*
(مێژوویی) ساچمە ۞ ساچمه

**case study** *noun*
لێکۆڵـــینەوەی کەیـــسی (کـــەس، کۆمـــەڵ یـــا بارودۆخێ) ۞ موردپژوهی

**case system** *noun*
شێوەیێ لە فێرکردنی ماف و قانوون کە لەودا کێشە دیارەکان بە بنچینەی لێکۆڵینەوە دەگیرێن ۞ آموزش با قضایا

**casework** /'keɪswɜ:k, US -wɜ:rk/ *noun*
1 لێکۆڵـینەوەی کەیـسی 2 کێشەڕەوینی کۆمەڵ (کـاری کۆمەڵایـەتی کـە لێکۆڵـینەوە لـەبارەی کەسـەکان، خێزانـەکان و کێشـەکان دەکـا) ۞ 1 موردپژوهی 2 مددکاری اجتماعی

**caseworker** /'keɪswɜ:kə(r), US -wɜ:rk-/ *noun*
کارساز یان کێشەڕەوێن لە کاروباری کۆمەڵدا ۞ مددکار اجتماعی

**cash**[1] /kæʃ/ *noun*
نەختینە، نەغدینە، پارە ۞ نقدینه، پول

**cash**[2] /kæʃ/ *noun*
(مێژوویی) کۆینێکی کەمبایی چینی، باشووری هیند و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ۞ کش

**cash and carry** *noun*
1 فرۆشگە یا دووکـانی کۆفرۆشی 2 بکڕە و بەرە (کڕینی نەغدی و بردنەوەی بە دەسـتی کڕیار) ۞ 1 فروشگاه یا مغازەی عمـدەفروشـی 2 سیـستمی در فروش

**cash book** *noun*
دەفتەری سنووق یان نەغدی، دەفتـەری کـرداری نەختی، دەفتـەری (پـارەی) دەسـتی، دەغیلـە ۞ دفتر تحویل‌دار

**cash box** *noun*
سنووقی پارە ۞ صندوق پول

**cash card** *noun*
کارتی بانک ۞ کارت عابر بانک

**cash crop** *noun*
بەرهـەمی (بـۆ)فـرۆش (لـەچاو بـۆ بـەکارهێنانی خودی جووتیار) ۞ محصول فروشی

**cash desk** *noun*
سنووق یان مێزی پارەپێدان ۞ صندوق پرداخت

**cash dispenser** = cash machine

**cashew** /'kæʃu:, US kæ'ʃu:/ *noun*
1 (هەروەها cashew nut) بادەمهیندی، کاکڵەی باقلەئاسـای خۆراکی، پڕ لە چەوری و پرۆتئینە 2 کەشـــوو، داری کەشـــوو [ *Anacardium occidentale*] ۞ 1 بلادر 2 درخت بلادر

**cash flow** *noun*
دەساودەس‌کردنی نەختی (نەغدینە) یان پارە ۞ جریان وجوه نقد

**cashier** /kæ'ʃɪə(r), US -'ʃɪr/ *noun*
سنووق‌دار، سنووقەوان، گەنجینەوان ۞ تحویل‌دار

**cashless** /'kæʃləs/ *adjective*
بێ‌دەساودەس‌کردنی پارەی نەغد، ناپارەیی، بێ‌پارەی نەغد دەکرێ: *We are moving towards the cashless society* ۞ انجام‌شـدنی بدون پول نقد

**cash machine** *noun*, also cashpoint, also cash dispenser
(دەزگا) پارەدەر(بە کارتی بانک) ۞ عابر بانک

**cashmere** /'kæʃmɪə(r), ˌkæʃ'm-, US 'kæʒmɪr, 'kæʃ-/ *noun, adjective*
پارچە یان کوتاڵی کەشمیر ۞ پارچەی کشمیر

**cashpoint cad** *noun*
کارتی بانک ۞ کارت بانک

**cash price** *noun*
نرخی بەنەغد یان نەغدی ۞ قیمت نقدی

**cash register** *noun*
(دەزگا) پارەنووس، سنووق ۞ صندوق

**casing** /'keɪsɪŋ/ *noun*
بەرگ، کیف، ڕووپۆش، ڕووکێش، چوارچێوە ۞ جلد، پوشش، چهارچوب

**casino** /kə'si:nəʊ, US -noʊ/ *noun, pl.* casinos
قومارخانە، کـازینۆ (بنـەڕەت: لـە ئیتالیـایی، لـە لاتین *casa* "cottage") ۞ قمارخانه

**cask** /kɑ:sk, US kæsk/ *noun*
1 پیپ، بۆشکە، کۆس، کووپەدارینە، کووپەی لەدار، کەمۆلـە، بـەرمیل (لـە دار) 2 کووپـەیێ، کۆسێ، پڕ کۆسێ ۞ 1 بشکه، چلیک 2 کاسک

**cask beer** *noun*
بیرە یان ئاوجۆری کۆسێ ۞ آب‌جوی چلیک

**casket** /'kɑ:skɪt, US 'kæs-/ *noun*
1 مجری، سنووق، قوتـو (بـۆ هەڵـگرتنی شـتە بەنرخ و گەوهەرینەکان) 2 (زۆرتر لە ئەمریکا (باکووری) دارتەرم، تابوت ۞ 1 جعبە 2 تابوت

**casque** /kɑ:sk/ *noun*
1 = helmet 2 (گیانەوەرناســـی) پێکهاتـــەی خودئاسا helmet-like وەکوو ئەوەی لەسەر دەنـووکی hornbill ـــە (بنـــەڕەت: لـــە *casco* سپانیایی) ۞ کاسک

**Cassandra** /kə'sændrə/ *noun*, Latin, from Greek *Kassandra*
کاســاندرا (پێغەمبـــەری مەینـــەتی: لـــە نـــاوی مێتۆلـۆژی یۆنـانی *Cassandra*، کچـی Priam پادشای تروا Troy، کە دیاری غەیب‌بێژی لە

لایەن ئاپۆلۆ Apollo وە پێبەخشرا و دوایی دڵی لێی رەنجا و وتی کەس نابێ گوێ لە پێشبێژییەکانی رابگرێ) ۞ کاساندرا

**cassation** /kə'seɪʃ(ə)n/ *noun*
شکاندن، پێشێل کردن، هەڵوەشاندنەوە، بەتاڵکردنەوە، پووچ‌کردنەوە ۞ نقض، الغا

**cassava** /kə'sɑːvə/ *noun*
1 ئاردی شیرگیا 2 (گیا) شیرهەرد، شیرگیا، دەوەنێکی دارئاسا [توخم *Manihot*: چەندین جۆرن] ۞ 1 آرد مانیوک 2 مانیوک

**Cassegrain telescope** /'kasɪgreɪn/ *noun*
دووربین یان تێلیسکۆپی کاسیگرەین ۞ تلسکوپ کاسیگرین

**casserole** /'kæsərəʊl, US -roʊl/ *noun*
(کاسە) پیرێکس، دیزە، تیلکە، قابلەمە، کەسێرۆل (جۆرێ چێشت کە لە کەسێرۆڵدا لێدەنرێ) ۞ پیرکس، قابلمە، کاسرول

**cassette** /kə'set/ *noun*
دەنگبەند، کاسێت، نەوار، شریت، زەفت، قوتوبەکی پلاستیکی کە فیلمی وێنەیی تیایە و دەخرێتە سەر کامێرا ۞ نوار، کاست

**cassette player** *noun*
زەفت، کاسێت‌پلەیێر، کاسێت‌پلەیەر ۞ ضبط صوت

**cassette recorder** *noun*
زەفت، کاسێت‌پلەیێر، کاسێت‌پلەیەر ۞ ضبط صوت

**cassette tape** *noun*
کاسێتی دەنگ‌بەند ۞ نوار کاستی

**cassia** /'kasɪə/ *noun*
1 (رووەکناسی) کاسیا: دار یان رووەکێکی دانەوێڵەیی مەڵبەندە گەرمەکان، senna و کۆمەڵێ بەرهەمی بەنرخی تر دەگرێ [توخم *Cassia*: گەلێ جۆرن] 2 توێکڵی بۆن‌خۆشی دارێکی رۆژهەڵاتی ئاسیا ( *Cinnamomum aromaticum*) کە جۆرێ cinnamonی ئایەخ دەگرێ (بنەڕەت: لە *qĕṣīʿāh* عیبرییەوە) ۞ 1 سلیخە 2 کاسیا

**Cassiopeia** *noun*, Latin, from Greek *Kassiopeia*
1 ژنی پادشا Cepheus کە ئاندرۆمیدای لێکەوتەوە و پاشان بووە کۆئەستێرەیێ 2 (ئەستێرەوانی) کاسیوپیا، ژن‌وتەخت: باکووریترین کۆئەستێرە نێوان Andromeda و Cepheus ۞ 1 کاسیوپیا 2 ذات‌الکرسی

**cassis**[1] /kæ'siːs/ *noun*, *also* crème de cassis
(فەرەنسی) کەسیس، کاسیس (خواردنەوەیەکی ئەلکۆلی شیرینی توندی بورگاندییە، لە blackcurrant دەگیرێ) ۞ کاسیس

**cassis**[2] /ka'si/ *noun*
مەی ناوچەی Cassis، شارێکی چکۆلە نزیک بە Marseilles ۞ کاسی

**cassiterite** /kə'sɪtərʌɪt/ *noun*, also tinstone
کانێکی زەردباو، سووباو یان قاوەییباو کە دوانۆکسایدی قالایی تیایە، سەرچاوەیێکی سەرەکی قالایی مێتالیکە ۞ کاسیتریت

**cassock** /'kæsək/ *noun*
1 جبە یا بالاپۆشی قەشەکان، عەبا 2 قەشە ۞ 1 ردای کشیشان 2 کشیش

**cassoulet** /'kasʊleɪ/ *noun*
چێشتێکی گۆشت و پاقلە ۞ کاسولت

**cassowary** /'kasəwəri, US -wɛːri/ *noun*, *pl.* cassowaries
باڵندەیێکی زۆر زلەی نەفڕ، پێوەندی بە emuوە هەیە، زۆرتر رەسەنی گینی نوێیە [توخم *Casuarius*: پێنج جۆرن] ۞ نوعی پرندە

**cast**[1] /kɑːst, US kæst/ *noun*
1 خستن، هاویشتن، حەوادان، تووڕدان 2 دەستەی هونەرمەند و ئەکتەران 3 گەچ (شکستەبەندی) 4 شتی رژاو یان داڕێژراو، داڕژاوە، دارشتە 5 داڕێژگە، قالب 6 شێوە، بیچم، رووکەش، تەرح 7 تیراوێژ، بەرتیر، ماوەبڕ 8 لێکدانەوە، مەزندە 9 مۆرەهەڵخستن، مۆرەهاویشتن 10 کەراژ، کەراژەمار 11 جۆر، چەشن، ئاوا 12 خێلی (کەمێ) 13 بنەڕەنگ، سووکەڕەنگ ۞ 1 پرتاب 2 گروە هنرپیشگان یا بازیگران 3 گچ 4 شی ریختە 5 قالب 6 ریخت، شکل 7 تیررس 8 محاسبە 9 تاس‌اندازی 10 پوست انداختەشدەی مار 11 نوع 12 لوچی 13 رنگ مختصر

**cast**[2] /kɑːst, US kæst/ *adjective*
داڕژاو، داڕێژراو، دارشتە ۞ ریختەشدە

**cast**[3] /kɑːst, US kæst/ = past and past participle of cast

**castanets** /ˌkæstə'nets/ *noun, pl.*
چەقەنە، چاروە، ب.ت. بۆ سەما و هەڵپەڕکێی سپانیایی بەکاردێتری (لە *castañeta* سپانیایی، چکۆلێنراوی *castaña*، لە *castanea* لاتینی بە واتای "chestnut") ۞ قاشقک

**castaway** /'kɑːstəweɪ, US 'kæst-/ *noun*
1 کەشتی شکاو 2 دەرپەڕێنراو، تووڕدراو، دەرکراو، پەڕەوازە، وەدەرنراو ۞ 1 کشتی شکستە 2 مطرود، راندە

**castaways** *noun, pl.*
کەشتی‌شکاوان، کەشتی‌نوقم‌بووان، کەشتی قلپەوەبووان ۞ کشتی‌شکستگان

**cast down** *adjective*
دڵتەنگ، خەمبار، مات، دڵپڕ، نارەحەت ۞ افسردە، اندوهناک

**caste** /kɑːst, US kæst/ *noun, adjective*
*n* 1 کاست (هەریەک لە چوار کەرتی کۆمەڵگای هیندی)، چینی کۆمەڵایەتی: *The*

2 *high-caste Brahmins ,Caste System* ڕیکخستە یان سیستمی چینایەتی 3 پێگە یان بایەخی کۆمەڵایەتی 4 (مێژووناسی) کۆمەڵچە *adj* کاستی ◇ *n* 1 کاست 2 طبقەی اجتماعی 3 سیستم طبقاتی، منزلت اجتماعی 4 کاست *adj* کاستی

**castellan** /'kastələn/ *noun*
(مێژوویی) بەرپوەبەری قەڵا، حاکمی قەڵا، قەڵاپرس ◇ حاکم دژ

**castellated** /'kæstəleɪtɪd/ *adjective*
(بیناسازی) 1 شوورەدار، قەڵادار 2 شێوەقەڵا، قەڵائاسا، قەڵایی ◇ 1 دارای استحکامات 2 دژمانند

**caster mark** *noun*
نیشانەی چین (هێند، هێمای جیاکردنەوەی چینی خۆ لەوانیتر) ◇ علامت کاست

**caster** = castor

**caster sugar** *noun*, also castor sugar
وردەشەکر، شەکری نەرم ◇ شکر ریز

**castigation** /ˌkæstɪ'geɪʃn/ *noun*
1 تەمێ، بیراز، تاشان، سزادان، تەزانـدن 2 سەرکۆنە، بەگژداهاتن 3 رەخنە (*n* castigator: سەرکۆنەکەر) ◇ 1 تنبیه 2 سرزنش 3 انتقاد

**castigatory** *adjective*
سزادەرانە، تەزێنەرانە ◇ تنبیهی

**Castilian** /ka'stɪlɪən/ *adjective, noun*
*adj* کاستیلیایی سەربە کاستیل یان کاستیلیەن *n* دانیشتووی رەسەنی سپانیای ناوەندی، ناوچەی کاستیل Castile *n* زمانی کاستیل، زمانی ستاندارد و ویژەیی سپانیا ◇ کاستیلیایی

**casting** /'kɑ:stɪŋ, US 'kæst-/ *noun*
1 دارشتە، دارێژراو، دارژاو 2 دارشتن 3 هەڵبژاردنی ئەکتەرەکان: *Casting was completed by May* ,*an odd piece of casting* ◇ 1 شی ریختە 2 ریختەگری 3 انتخاب هنرپیشگان یا بازیگران

**casting vote** *noun*
دەنگی دیاریکەر یان یەکلاییکەرەوە (کاتێ کە دەنگی ئەرێ و نەرێ بە قەد یەکن) ◇ رأی سرنوشت‌ساز

**cast iron** *noun*
1 چەودەن، ئاسنی دارشتە 2 (وەک ئاوەڵناو، هەروەها cast-iron) پۆلایین، سەخت، تۆکمە، نەگۆڕاو، پتەو، مکوم، قایم، رەختە: *there are no cast-iron guarantees* ◇ 1 چدن 2 (صفت‌گونه) استوار، سخت

**castle** /'kɑ:sl, US 'kæsl/ *noun*
قەڵا، دژ، هەسار، کۆشک، تەلار، سەرا (castled *adj*) ◇ دژ، قلعە، کاخ

**cast-off** *adjective, noun*, also hand-me-down especially in US
*adj* بەکارنەهاتوو، شرە، بێکارە، کۆنە *n* (casts-off) جلوبەرگی کۆنە، شرە ◇ *adj* بەدردنخور *n* (در جمع) لباس بەدردنخور

**castor** /'kɑ:stə(r), US 'kæs-/ *noun*, also caster
1 تگەر، چەرخ، پێچکە، خرتک، رەورەوە، خرخرە (هی ژێر بەفرخەرە (یان یەخچاڵ)، کومێد و هتد) 2 (لە لێکداندا) ـبرژێن 3 (رووەکناسی) گەرچەک، کرنگ ◇ 1 چرخ 2 ـپاش 3 (گیاەشناسی) کرچک

**Castor** /'kɑ:stə(r), US 'kæs-/ *noun*, Latin, from Greek *Kastōr*
کاستور: یەکێ لە Dioscuri؛ ئەستێرەی یەکەمی جووتەوانە Gemini ◇ کاستور

**castor bean** *noun*
دەنکی گەرچەک (= ئاویتەیێکی جەوکی ژاراوی تیایە) ◇ کاستر بین

**castoreum** *noun*, also castor
گونسەگاوی: ماکێ کە بە هۆی رژێنەکانی بنی رانی سەگاو دەردەدرێ و لە بواری پزشکی و گوڵاوسازیدا بەکاردێنرێ ◇ جُند بیدستر، کاستوریوم

**castor oil** *noun*
رۆنە کرنگ، رۆنە گەرچەک، شیرە، گەنەگەرچەک (لە دەنک و دانی گەرچەک [*Ricinus communis*]) ◇ روغن کرچک

**castor sugar** = caster sugar

**castration** /kæ'streɪʃn/ *noun*
1 خەساوی 2 خەساندن، ئیختەکردن، یەختەکردن، خواجەکردن، باتوودەرکێشی ◇ 1 اختگی 2 اختەسازی

**castration complex** *noun*
گرێ(ک) یان کامپلێکسی خەساوی ◇ عقدەی اختگی

**Castroism** *noun*
کاستڕۆگەری، کاستڕۆباوەری: بنەما کۆمەڵی، ئابووری و سیاسییەکانی فیدیل کاستڕۆ Fidel Castro ◇ کاستروگرایی

**Castroite** *noun*, also Castroist
کاستڕۆگەر، کاستڕۆباوەڕ، لایەنگری کاستڕۆ ◇ کاستروگرا، پیرو کاسترو

**cast steel** *noun*
پۆڵای دارشتە ◇ فولاد ریختەشدە

**casual** /'kæʒuəl/ *adjective, noun*
*adj* 1 ڕێکەوتی، هەڵکەوتی، بەختەکی: *a casual encounter/meeting* ,*a casual passer-by* 2 نامەبەستی، نائەنقەستی 3 کەمتەرخەم، بێخەیاڵ، بێدەربەست، لامەرلا، بێئەندیشە، گوێپێنەدەر، لاسار، ئالۆری، نەرشت، بەتەنگەوەنەبوو، نابەرپرس: *a casual* 4 *a casual friendship ,acquaintance* سەرزارەکی، رەمەکی، فشە، سەرسەرەکی: *a*

*It's obvious even to the casual glance* : کاتی 5 *casual observer* خۆمانه، نافەرمی 6 *family parties and other casual occasions* ناهەمیشەیی، کاتی، بەرووخت، پچڕپچڕ، 7 ناڕیکوپێک : *casual workers/labour* *Students sometimes do casual work in the tourist trade* کریکاری کاتی، 1 *n* بەرکاتی 2 (casualts) کەوش و جلوبەرگی نافەرمی ◌ *adj* 1 تصادفی، اتفاقی، برخوردی 2 غیرعمدی 3 بی‌توجه، بی‌اعتنا، بی‌تفاوت 4 سطحی 5 موقت 6 خودمانی 7 موقت، منقطع *n* 1 کارگر موقت 2 (در جمع) البسه یا کفش‌های غیررسمی

**casualism** *noun*

ڕیکەوتگەری، ڕیکەوتخوازی، ڕیکەوتباوەری ◌ اتفاق‌گرایی

**casualist** *noun*

ڕیکەوتگەر، ڕیکەوتخواز، ڕیکەوتباوەر ◌ اتفاق‌گرا

**casually** /ˈkæʒuəli/ *adverb*

1 بەڕیکەوت 2 بە کەمتەرخەمییەوە 3 سەرسەرەکی، (بەشێوەیەکی) ڕەمەکی ◌ 1 برحسب اتفاق 2 با بی‌قیدی 3 به طور سطحی

**casualness** /ˈkæʒuəlnəs/ *noun*

گوێپێنەدان، کەمتەرخەمی، نادەربەستی، بێخەمی، بێئەندیشەیی، نابەرپرسایەتی، بەتەنگەوەنەبوون ◌ بی‌اعتنایی، بی‌قیدی

**casualty** /ˈkæʒuəlti/ *noun, pl.* casualties

1 گوێپێنەدان، بەرشت نەگرتن، کەمتەرخەمی، بێدەربەستی، لامەرلایی 2 قوربانی، (casualties) بریندار و کوژراو، پێکراوان، تەنگاوتە 3 بەشی فریاکەوتن، بەشی تەنگەتاوی یان بەشی ڕووداوەکان (نەخۆشخانە)، ڕووداو، بوویەر، قەومین ◌ 1 بی‌اعتنایی 2 (در جمع) قربانی 3 بخش سوانح، حادثه، سانحه

**casualty department** *noun*

بەشی تەنگەتاوی یا فریاکەوتن ◌ بخش سوانح

**casualty ward** *noun*

بەشی تەنگەتاوی، بەشی فریاکەوتن یا زووچارەسەری ◌ بخش سوانح

**casuist** /ˈkazjuɪst, US -ʒj-/ *noun*

زمانباز، چەواشەگەر، کازیوئیست ◌ سفسطه‌گر

**casuistical** *adjective*, also casuistic

زمانباز(یی)انە، چەواشەگەرییانە ◌ وابسته به سفسطه‌گری

**casuistry** /ˈkæʒuɪstri/ *noun*

زمانبازی، چەواشەگەری، سەفسەتە ◌ سفسطه، مغالطه

**casus belli** /ˌkeɪsəs ˈbelaɪ, US ˌkɑːsus ˈbeliː/ *noun, pl.* casus belli

(لاتین) هۆی یا بیانووی شەڕ، مایە یا هەوێنی شەڕ ◌ سبب جنگ

**cat** /kæt/ *noun*

1 پشیلە، پسیک، پسک، پش، پشی، دەلک، کتک، تیرەپشیلە، پشیلان، لە خێزانی Felidae [*Felis catus*] 2 ژنی رقاوی یان بوغزاوی ◌ 1 گربه، گربه‌سان 2 زن غرض‌آلود

**CAT** *abbreviation* Collage of Advanced Technology

کۆلێژی تێکنۆلۆژی پێشکەوتوو ◌ کات

**cata- (also cat-)** *prefix*

پێشگر: 1 خوارەوە، بۆ خوارەوە، بەرەو خوارەوە، دەمەوژێر، دەمەوخوار، ڕوولە خوارەوە، داـ ڕۆ: *catadromous* 2 بە هەڵە، بە نادروستی: *catachresis* 3 تەواو، بە تەواوەتی: *cataclysm* 4 دژی، بە دژی، بە درێژایی، بە درێژی: *catechize* (لە *kata* یونانییەوە "down") ◌ پیشوند: 1 پایین، به طرف پایین 2 به غلط 3 کاملاً 4 علیه، در امتداد

**catabolic** /katəˈbɒlɪk/ *adjective*

سەربە کاتابولیزم یان پووکانەوە، کاتابۆلیک ◌ وابسته به کاتابولیسم

**catabolism** /kəˈtæbəlɪzəm/ *noun*

کاتابۆلیزم، پووکانەوە (هەروەها katabolism، بروانە anabalism، هەروەها destructive metabolism) ◌ کاتابولیسم

**catachresis** /ˌkatəˈkriːsɪs/ *noun, pl.* catachreses /-siːz/

خراپ بەکارهێنان، هەڵەبێژی (وشەیێ) ◌ استعمال غلط

**catachrestic** /-ˈkriːstɪk, US -ˈkrɛstɪk/ *adjective*

سەربە خراپ بەکارهێنان، هەڵەبێژییانە ◌ وابسته به استعمال غلط

**cataclasis** /ˌkatəˈkleɪsɪs/ *noun*

(زەویناسی) شکان و وردبوونی بەرد بەهۆی ڕەوت و کاری سروشتییەوە، داشکێنی (بنەڕەت: لە -cata + *klasis* یونانییەوە "breaking") ◌ کاتاکلاسیس

**cataclastic** /-ˈklastɪk/ *adjective*

سەربە کاتاکلاسیس، سەربە داشکێنی ◌ وابسته به کاتاکلاسیس

**cataclysm** /ˈkætəklɪzəm/ *noun*

1 کارەسات، بەڵا، فەتارەت، ناسۆ: *to survive* 2 *the cataclysm of the Black Death* وەرچەرخان، وەرگۆڕان، سەرووبنبوون، هەڵاوگێڕی، هەڵتەکان 3 گۆڕانی ناکاو و توند، وەرگەران 4 ڕووداوی سەخت یان توندوتیژ ◌ 1 مصیبت، فاجعه 2 انقلاب 3 دگرگونی ناگهانی و شدید 4 حادثه‌ی عنیف

**cataclysmic** /ˌkætəˈklɪzmɪk/ *adjective*, also cataclysmal

کارەساتاوی، جەرگبڕ، دڵتەزێن، ناخۆش ◌

مصیبت‌بار، فاجعه‌آمیز

**cataclysmically** /ˌkætəˈklɪzmɪkli/ *adverb*
بــه شــێوه‌یێکی کاره‌ســاتاوی، جه‌رگبڕانــه، دڵته‌زێنانه، به شێوه‌یێکی ناخۆش ◌ به طور مصیبت‌بار یا فاجعه‌آمیز

**catacombs** /ˈkætəkuːmz, US -koʊmz/ *noun*
گۆڕستان یان قه‌برستانی ژێرزه‌وی (ڕۆمای کۆن؛ بنـه‌ڕه‌ت: لـه late Latin *catacumbas*، نـاوی گۆڕستانێکی ژێرعـه‌رزی سـه‌ینت Sebastian نزیک به ڕۆم) ◌ گورستان دخمه‌ای

**catadioptric** /ˌkatədʌɪˈɒptrɪk/ *adjective*
ئاماژه به ڕێکخسته یان سیستمێکی ڕووناکی که هـه‌م پـه‌رچانـه‌وه reflection و هـه‌م شـکانه‌وه refraction ی ڕۆشـنایی ده‌گرێتـه‌وه تـا لادان که‌م‌تر کاته‌وه ◌ کاتادیوپتریک

**catadromous** /kaˈtadrəməs/ *adjective*
(گیانـه‌وه‌رناسی، ماسـی‌یێ) ژێـرڕه‌و، ژێرڕاکـه‌ر، خـواریڕاکـه‌ر: لـه ئـاوی شـیرین‌دا ده‌ژی و بـۆ گه‌رادانان بـه‌ره‌و ده‌ریـا ده‌چـێ: *catadromous eels* (دژی anadromous، بنـه‌ڕه‌ت: لـه cata- + *-dromus* -dromous) ◌ کاتادروموس

**catafalque** /ˈkætəfælk/ *noun*
سه‌کۆی دارته‌رم، مێزی دارته‌رم ◌ نخل تابوت

**Catalan** /ˈkætəlæn/ *adjective, noun*
*adj* کاتالۆنیـایی، کاتـالان سـه‌ربه کاتالۆنیـا، گه‌له‌کـه‌ی یـان زمانه‌کـه‌یان *n* 1 دانیـشتووی ڕه‌سه‌نی کاتالونیا (باکووری ڕۆژهه‌لاتی سپانیا) 2 زمـانی ڕۆمـانی کاتالۆنیـا کـه پێوه‌نـدی‌یـه‌کی تونـدی بـه سـپانیایی کاسـتیلیایی Castilian و پرۆڤێنسـایی‌یه‌وه Provençal هه‌یه ◌ کاتالان

**catalase** /ˈkatəleɪz/ *noun*
(زینده‌کیمیا) کاتالاز: هه‌وێنه‌یێ که پێرۆکسایدی هایدرۆژین بۆ ئۆکسیژین و ئاو شی ده‌کاته‌وه، هه‌وێنـه‌یێ کـه تـاوی ڕێداکێشێ hydrogen peroxide ده‌دا (بنـه‌ڕه‌ت: لـه catalysis + -ase پێکهاتووه) ◌ کاتالاز

**catalatic** *adjective*
کاتالازی، سـه‌ربه یـان پێوه‌ندی بـه کاتـالازه‌وه هه‌یه ◌ کاتالازی

**catalectic** *adjective, noun*
*adj* خـاوه‌نی پایـه‌یێکـی ناتـه‌واو لـه کۆتـایی هۆنراوه‌دا، (له‌مه‌ڕ دێڕه هه‌لبه‌ستێ) بـه‌بێ بـه‌شی دوایین پایه، به‌بێ بڕگه له کۆتایی دێڕه شێعرێ‌دا *n* دێڕه هه‌لبه‌ستێکی کاتالێکتیک ◌ کاتالکتیک

**catalepsy** /ˈkætəlepsi/ *noun*, also catalepsis
که‌ته‌لێپسی، بێهۆشی‌یێ کـه لـه‌ودا ماسـوولکه‌کان ڕه‌ق ده‌بـن، ڕه‌قبـوونی له‌شـی (نه‌خۆشـی) ◌ جمود خلـه‌ای

**cataleptic** /ˌkætəˈleptɪk/ *adjective*
له‌ش‌ڕه‌قبوو ، تووشبوو بـه ڕه‌قبـوونی له‌شـی ◌ دچار جمود خلـه‌ای

**catalexis** *noun, pl.* catalexes
ناته‌واوی له دوایین پایه‌ی دێڕه هه‌لبه‌ستێ ◌ نقص وتد

**catalogue** /ˈkætəlɒg, US -lɔːg, -lɑːg/ *noun*, also catalog
کاتـالۆگ، پێرسـت، ڕیـزه، لیـست، فیرسـت ◌ کاتالوگ، فهرسـت، صورت

**catalogue raisonné** /ˌreɪzɒˈneɪ/ *noun, pl.* catalogues raisonnés pronunc. same
جـــۆرێ کاتـــالۆگی په‌راوێزله‌گـــه‌ڵ یـــان له‌گـه‌ڵ‌لێکدانـه‌وه annotated ی سیـستماتیک، جۆرێ کاتـالۆگ لـه‌سـه‌ر بنچینـه‌ی بـاس‌کـردن لـه‌سـه‌ر کـاره‌کـانی هونـه‌ر کـه ڕوون‌کردنـه‌وه و تێبینی تیایێ (بنه‌ڕه‌ت: له فه‌ره‌نسی‌یه‌وه "کاتالۆگی ڕوونه‌وه‌کراو") ◌ کاتالوگ، فهرست، صورت

**Catalonian** = catalan

**catalpa** /kəˈtalpə/ *noun*
(ڕووه‌ک‌ناسی) داردره‌وش: ڕه‌سه‌نی ئه‌مریکای باکووری و ڕۆژهه‌لاتی ئاسیا [توخم *Catalpa*] (بنه‌ڕه‌ت: له یۆنانی‌یه‌وه) ◌ درخت جوالدوزک

**catalysis** /kəˈtæləsɪs/ *noun, pl.* catalyses
(کیمیـا و زینـده‌کیمیـا) هانـدان، تـاودان، کاتـالیز، کاتالیـــیس: *the catalysis of organic reactions* ◌ کاتالیز

**catalyst** /ˈkætəlɪst/ *noun*
هۆکاری هانده‌ر یان تـاوده‌ر، تـاوده‌ره، فـاکتێری تـاوده‌ر، مه‌تریالـی هانـده‌ر، هانـده‌ره، تـاوده‌ره، که‌سێ یان شتێ که ده‌بێته هۆ و مایه‌ی گۆڕان: *Chlorine will act as a catalyst* ◊ *I see my role as being a catalyst for change* ◊ *The riots were later seen as the catalyst for the new political developments* ◌ کاتالیزور

**catalytic** /ˌkætəˈlɪtɪk/ *adjective*
هانده‌رانه، تاوده‌رانه، سـه‌ربه هاندان، ده‌بێته هۆ یـان کاتـالیز ده‌گرێتـه‌وه: *catalytic processes* (catalytically *adv*) ◌ فروکافتی، کاتالیزوری

**catalytic agent** *noun*
کارای تاوده‌ر یان هانده‌ر ◌ عامل کاتالیزور

**catalytic cracker** *noun*
ده‌زگای وردکردن له پاڵ تاوده‌ر له پالاوتگه‌ی نه‌وت ◌ کاتالیتیک کراکر

**catamaran** /ˌkætəməˈræn/ *noun*
کاتاماران (- جۆرێ به‌له‌می باگه‌ڕدار، بنه‌ڕه‌ت: له *kattumaram* تامیل) ◌ کاتاماران

**catamenia** /ˌkætəˈmoːnɪə/ *noun*
بێ‌نوێژی، پیـسـار، که‌وتنه‌سـه‌رخوێن، menses (catamenial *adj*) ◌ حیض

**catamite** /ˈkætəmaɪt/ *noun*
(کۆن) کـوونی، قونده‌ر، حیـز، لووسـکه، پوشـت، گانده‌ر (نۆکه‌رێ بۆ ئه‌و مه‌به‌سته؛ بنه‌ڕه‌ت: له

لاتین، بە ریگای ئیتروریایی لە *catamitus* یونانی "Ganymede" *Ganumēdēs* "ناوی مەیگێری زیوس") ◌ مأبون

**catamount** /ˈkatəmaʊnt/ *noun*, also catamountain /ˌkatəˈmaʊntɪn/
پشیلە (یێکی دەستەی) کێوی، ب.ت. (ئەمریکا) puma ◌ کاتامونت

**cat-and-dog** *adjective*
وەکوو سەگ و پشیلە، دایمە بە هەرا و کێشە یان کێشەکێش، بە کێشە ویستاو ◌ مثل سگ و گربە

**cataphatic** /ˌkatəˈfatɪk/ *adjective*
(یەزدانناسی، لەباری زانستی خوداوە) بە ریگای سەلماندنەوە بە دەس‌هاتووە (دژی apophatic) ◌ کاتافاتیک

**cataphor** /ˈkætəfə(r), US -fɔ:(r)/ *noun*
(زمانەوانی) کاتافور ◌ کاتافور

**cataphora** /kəˈtæfərə/ *noun*
(زمانەوانی یان ریزمان) مەرجەعی پاش‌تر یان پاش‌هاتە (وەک: لە *he* لە *he may be approaching 37, but Jeff has no plans to retire yet* بڕوانە anaphora cataphoric cataphorically /katəˈfɒrɪk/ *adj* /katəˈfɒrɪkli/ *adv*) ◌ مرجع پسایند

**cataphoresis** (*pl.* cataphoreses, cataphoretic *adj*) – electrophoresis

**cataphract** *noun*
جۆری زریی کۆن ◌ کاتافراکت

**cataplasia** *noun*
ناڵوگۆری پاش‌داچوونە لە خانەدا ◌ کاتاپلاسیا

**cataplasm** /ˈkatəplaz(ə)m/ *noun*
(کۆن) خاوکەرەوە، نیوەنمەک، نویتمەک، رەویتەرە ◌ ضماد

**cataplexy** /ˈkatəˌplɛksi/ *noun*, *pl.* cataplexies
کاتاپلیکسی: لەدەس‌دانی کوت‌وپڕی هێزی ماسوولکە لە ئەنجامی باڵنەریکی سۆزی بەهێز (cataplectic *adj*) ◌ کاتاپلکسی

**catapult** /ˈkætəpʌlt/ *noun*
1 قوچەقانی، کەفکانی، بەرەقانی، قاڵماسک، چەکچەکی، کەهنیک، قۆزک 2 مەنجەنیک، هیلکاڵ، هیلکان، بەردهاویژ 3 دەزگای خستن، هەلدەرە (لەسەر کەشتی، فرۆکە بۆ ئاسمان) ◌ 1 تیرکمان 2 منجنیق 3 پرتاب‌کنندە

**cataract** /ˈkætərækt/ *noun*
1 تاڤگە، ریزاو، سواق، هەلدیر (گەورە)؛ *cataracts* لافاو، لیشاو، رەهێلە: downpour 2 *cataracts of information* ◊ *of rain* ئاو مرواری، ماشاو، ناوی سپی، ئاقاسپی، تانە (cataractous *adj*) ◌ 1 آبشار 2 آب مروارید

**catarrh** /kəˈtɑ:(r)/ *noun*
هەلامەت، دەمەنی، پەسیو، پەسیف، ئارسم، چلمەشوری، پەژیک ( catarrhal /kəˈtɑ:rəl/ *adj*) ◌ زکام، نزلە

**catarrhine** /ˈkatərʌɪn/ *adjective*, *noun*, also catarrhinian
(گیانەوەرناسی) کاتاراین، لووت‌قوولایی (مەیموونەکانی دنیا یان جیهانی کۆن، gibbon و مرۆڤەکان، بڕوانە great ape platyrrhine) ◌ کاتارینی

**catastasis** *noun*, *pl.* catastases
1 پێشەکی 2 دوایین رادەی رۆڵی شانۆ ◌ 1 مقدمە 2 کاتاستاز

**catastrophpe** /kəˈtæstrəfi/ *noun*
1 کارەسات، فەتارەت، بەلا، ئاسیو، ناگر، رووداوی جەرگبڕ، مەینەتی، تەلەزگە 2 ئاکام denouement ی درامایی، ب.ت. تراژیدی کۆن (بنەرەت: لە *catastropha* لاتین، لە *katastrophē* یونانی "وەرسووڕانی ناکاو") ◌ 1 فاجعە، مصیبت 2 کاتاستروف

**catastrophpe theory** *noun*
تیۆرییێکی ماتماتیک کە بە ریگای بەکارهێنانی توپۆلۆژی رووداوەکان روون دەکاتەوە (وەک بوومەلەرزە و دابەزینی بورس) و بەهۆی گۆڕانی گەورەی ناکاو دیاری دەکری ◌ نظریەی کاتاستروف

**catastrophpic** /ˌkætəˈstrɒfɪk, US -ˈstrɑ:- / *adjective*, also -trophpic
کارەساتاوی، جەرگبڕ، دڵتەزین، مەینەتبار، ئاپۆرە (catastrophpically /-kli/ *adv*: جەرگبڕانە) ◌ فاجعەآمیز، مصیبت‌بار

**catastrophpism** *noun*
(زەوی‌ناسی) کارەسات‌گەری، تیۆرییێ کە پێی وایە گۆڕانەکانی توێکڵی زەوی بە دریژایی میژووی زەوی‌ناسی زۆرتر لە ئەنجامی رووداوە ناتاسایی و توندوتیژە ناکاوەکاندا پێکهاتوون (catastrophpist *n.* *adj*، بڕوانە uniformitarianism) ◌ کاتاستروفیسم

**catatonia** /ˌkætəˈtəʊniə, US ˈtoʊ-/ = catalepsy

**catawba** /kəˈtɔ:bə/ *noun*
1 جۆری تریی ئەمریکای باکووری 2 مەی ئەو تریێە (بنەرەت: لە ناوی رووباری *Catawba* لە کارۆلینای باشووری و باکووری) ◌ کاتاوبا

**catbird** *noun*
باڵندەمیاونە (وەک پشیلە میاومیاو دەکا [*Dumetella carolinensis* (ئەمریکای باکووری) و جۆرەکانی تر]) ◌ کات‌برد

**catboat** *noun*
گەمی یەک‌بادەوەی یەک‌دارالا ◌ کات‌بوت

**cat burglar** *noun*
دز، چەتە، مالبر ◌ دزد

**catcall** /'kætkɔ:l/ *noun*
فیکە، قیژە، هووهـا، هۆ (بۆ دەبڕینی نارەزایی لە وتەکانی وتاربێژێ) ⟐ سوت

**catch** /kætʃ/ *noun*
1 گـرتن، گیرخستن، چنـگ پێـوەگرتن، دەس لێ گیرکردن، گیر کردن: *to make a catch*
2 قوڵاپ، گیرگە، گیرە 3 چەفت 4 قوفڵ: *a catch on the door* ◊ *safety catches for the windows* 5 ڕاو، بەرەڕاو: *a huge catch of fish* 6 کێشە، گرفتاری، گیر، گیرەوکێشە: *All that money for two hours' work—what's the catch?* 7 دروشم، وشەی بەرچاو 8 مەتەڵ
⟐ 1 گرفتن، گیرش 2 قلاب 3 چفت 4 قفل 5 صید، مقدار ماهی صیدشده در یک وهله 6 مسأله، مشکل، گرفتاری 7 شعار 8 معما

**catch-22** *noun, adjective*
*n* بـاروودۆخی ئالـۆز، گـرفتی بـێ دەرەتـان، ئاستەنگ، گێنجەڵ، گرێ پووچکە، گرێ کوێرە *adj* چارەنـەهاتوو، چارەسـەرنەکراو، لەچارەنەهاتوو (بنەڕەت: تایتڵی یان سەرناوی ڕۆمانی (1961) Joseph Heller) ⟐ *n* وضع بغرنج، مشکل بدون مفر *adj* حل‌نشدنی

**catch-all** *adjective*
1 لێل، تەژمە، تەموومژاوی 2 گشتی (وشە یان دەستەوشەیەێ): *a catch-all phrase/term* ◊ *dyspepsia is a catchall term for stomach discomfort* 3 گەنجینەی شرەوبرە یان پرووپیت، جێگا یان جێی شرەوشاتاڵ: *a catchall tray*
⟐ 1 گنگ 2 کلی 3 جعبەی خرت‌وپرت

**catcher** /'kætʃə(r)/ *noun*
بگر، وەرگر، گر، گیر (زۆرتر لە لێکداندا): *a rat catcher* ⟐ گیرندە

**catchfly** *noun, pl.* catchflies
مێشەگیرە campion یان ڕووەکێکی پێوەندیدار بە قەد یان لاسکی لینجەوە sticky، لە خێزانی pink، جاروبار لە کاسەڵەکەی calyx مێرووەکان گیر دەخۆن [*Lychnis, Silene*] ⟐ نوعی گیاه

**catching** /'kætʃɪŋ/ *adjective*
1 بگرەوە، گیرۆ، پەتا، contagious، infectious 2 دڵرفێن، attractive، alluring ( catchingly *adv*، catchingness *n*) ⟐ 1 واگیردار 2 جذاب

**catchline** /'kætʃlaɪn/ *noun*
(بریتانیا) دروشمی جاڕدەرانە یان بانگەشەیی ⟐ شعار تبلیغاتی

**catchment area** /'kætʃmənt eəriə, US eriə/ *noun,* also catchment basin
1 ئاوڕێژگە، ئاوڕێژ، ڕێژگە، ئاوگر، drainage basin 2 (بۆ خوێندنگاکان، نەخۆشخانەکان و هتد) مەڵبەندی خزمەتگوزاری ⟐ 1 حوضەی آبریز 2 منطقەی خدماتی

**catchpenny** /'kætʃpeni/ *adjective, noun* (*pl.* catchpennies)
*adj* پارەدەرهێن، بازاڕی، هەرزانبایی *n* بابەت یا شتێکی بازاڕی ⟐ *adj* پول‌ساز *n* قلم پول‌ساز

**catchphrase** /'kætʃfreɪz/ *noun*
وێردی سەرزمان، سەرزمانە ⟐ تکیەکلام

**catchpole** *noun,* also catchpoll
1 ئەفسەری قەرزارگر 2 باجگر، باجئەستێن ⟐ 1 مأمور توقیف اشخاص بدهکار 2 مالیات‌گیر

**catchup** /'katʃʌp/ = ketchup

**catchword** *noun*
1 دروشم، درف 2 سەرپەڕ (وشە، هی سەرەوەی لاپەڕەی کتێب) ⟐ 1 شعار 2 سرصفحە

**catchy** /'kætʃi/ *adjective* (catchier, catchiest)
1 پێچ‌پێچ، ناڕێک، irregular: *catchy breathing* 2 سەرنجڕاکێش، خۆش، زووفێربوو، بالکێش: *a catchy tune* ( catchily /'kætʃɪli/ *adv*، catchiness /'kætʃinəs/ *n*) ⟐ 1 منقطع 2 جذاب، گیرا

**catechesis** /ˌkatɪ'ki:sɪs/ *noun, pl.* catecheses
ئامۆژگاری یان فێربوون بە ڕێگای پرسیار و وەڵامەوە، دەستووری زارەکی (دینی) یان دەستووری دینی زارەکی ⟐ تعالیم مذهبی شفاهی

**catechetical** /ˌkatɪ'kɛtɪk(ə)l/ *adjective,* also catechetic
تایبەت بە فێربوون بە ڕێگای پرسیار و وەڵامەوە (catechetically /ˌkatɪ'kɛtɪk(ə)li/ *adv*) ⟐ وابستە بە آموزش از راه پرسش و پاسخ

**catechin** /'katɪtʃɪn/ *noun*
(کیمیا) ئاوێتەیێکی ئەندامی organic compound کریستاڵی کە پێکهێنەری بنەڕەتی catechu ـە [$C_{15}H_{14}O_6$] ⟐ کاتچین

**catechetics** /ˌkatə:kɛtɪks/ *noun, pl.*
هونەری فێرکردنی بنەماکانی دین بە ڕێگای پرسیار و وەڵامەوە ⟐ فن تعلیم اصول مذهبی

**catechism** /'kætəkɪzəm/ *noun*
1 فێرکردنی زارەکی یان لە ڕێگای پرسیارەوە، بنەماکانی دین یان ئایین (کۆمەڵێ لەو پرسیار و وەڵامانەی کە بۆ فێرکردنی خەڵک لەبارەی بیروباوەڕی دینی کریستانیەتەوە بەکاردێترێن)، پرسیارنامەی دینی یان ئایینی، دەستووری زارەکی oral instruction 2 بنەماکان، بنچینەکان، ماکان ⟐ 1 اصول دین، پرسش‌نامەی مذهبی 2 مبانی

**catechismal** /'kætəkɪzəml/ *adjective*
سەربە فێرکردنی زارەکی یان بنەماکانی دین ⟐ وابستە بە اصول دین یا تعلیم شفاهی

**catechist** *noun*
مامۆستایێکی کریستیەن، ب.ت. کەسێ کە خەریکی catechism ـە ( catechistic or

(catechistical *adj*) ۞ کاتکیست

**catechization** *noun*
فێرکردنی (بنەماکانی دین) بە ڕێگای پرسیار و وەڵامەوە ۞ کاتچیزاسیون

**catechol** /ˈkatɪtʃɒl, US -kɒl/ *noun*, also pyrocatechol
(کیمیا) 1 کەتیچۆل، ئاوێتەیێکی ئەندامی کریستاڵی، لە دڵۆپاندنی catechu دەگیرێ ۞ catechin = 2 $C_6H_6O_2$ کاتچول

**catecholamine** /ˌkatɪˈkəʊləmiːn/ *noun*
(یندەکیمیا) هەریەک لە ئەمینەکان (وەک epinephrine، norepinephrine و dopamine) کە وەک هۆرمۆنەکان یان neurotransmitter یان هەردووکیان کار دەکەن ۞ کاتچولامین

**catechu** /ˈkatɪtʃuː/ *noun*
(کیمیا) 1 کاتیشو، کات یان کادی هیندی 2 = gambier ۞ کاد هندی

**catechumen** /ˌkatɪˈkjuːmɛn/ *noun*
ئامادەکردنی کەسێکی کریستانی بۆ تەوفن یا confirmation ۞ کاتکیومن

**categorical** /ˌkætəˈgɒrɪkl, US -ˈgɔːr-/ *adjective*, also categoric
1 ڕەها، یەکلایی‌کەرەوە، یەکجارەکی، بێ‌ئەملاوئەولا، بێ‌چەندوچۆن، بێ‌مەرج، بێ‌شەرت‌ومەرج، absolute، unqualified: *a categorical denial* ◊ *to make a* 2 ڕۆشن، روون، دیار، *categorical statement* ئاشکرا ۞ 1 مطلق، بدون قید و شرط، قاطع، قطعی 2 صریح

**categorically** /-kli/ *adverb*
بەشێوەیەکی یەکلاییکەرەوە ۞ به طور قطعی

**categorization** *noun*
دەستاندن، دەستەکردن، بابەت‌بابەت‌کردن، بابەتاندن، پۆلاندن، دابەشاندن ۞ طبقه‌بندی، رده‌بندی

**category** /ˈkætəgəri, US -gɔːri/ *noun*, *pl.* categories
بابەت، دەست، دەستە، پۆل، class: *The results can be divided into three main categories* (categorial *adj*) ۞ مقوله، طبقه

**category change** *noun*
گۆڕانی بابەت ۞ تغییر مقوله

**category of meaning** *noun*
بابەتی واتا، کاتیگۆری واتا یان مانا ۞ مقوله‌ی معنا

**category shift** *noun*
گۆڕانی بابەت ۞ تغییر مقوله

**category symbol** *noun*
هێما یان نیشانەی بابەت ۞ نماد مقوله

**catena** /kəˈtiːnə/ *noun*, *pl.* catenae /-niː/ or catenas
زنجیرە (لە لاتینەوە بە واتای "زنجیر chain") ۞ رشته، سلسله

**catenarian** /ˌkætəneriːən/ *adjective*
زنجیرەیی، زنجیرەمەند، زنجیرەدار ۞ تسلسلی

**catenary** /kəˈtiːnəri/ *adjective, noun, pl.* catenaries
زنجیری، زنجیرمەند، لێک‌هەڵپێکراو ۞ مسلسل

**catenated** /ˈkatɪneɪtɪd/ *adjective*
زنجیرەیی، زنجیرئاسا ۞ تسلسلی

**catenation** /ˈkətəneɪʃn/ *noun*
زنجیرەیی، زنجیرمەندی، لێک‌هەڵپێکراوی، بەستراوی، پێک(ەوە)بەستراوی، پێک‌بەندی ۞ تسلسل، پیوستگی

**catenoid** /ˈkatənɔɪd/ *adjective*, also catenulate
(ئەندازە) زنجیرئاسا، شێوەزنجیر، زنجیری ۞ زنجیرمانند

**cateran** /ˈkat(ə)r(ə)n/ *noun*
(مێژوویی) شەڕکەر یان پەلامارده‌رێ کە لە چیانشینانی سکاتلەند بێ (بنەڕەت: لە *ceathairne* گەیلی سکاتلەندی "peasantry") ۞ کاتران

**cater-cornered** /ˈkeɪtəˌkɔːnəd/ *adjective, adverb*, also cater-corner, catty-cornered, kitty-corner
لار، خوار، لابەلا، پلووچ، کەچ ۞ کج، به طور مورب

**caterer** /ˈkeɪtərə(r)/ *noun*
1 خۆراک ئامادەکار، بەرپرسی ئامادەکردنی چێشت و خوان (لە شایی، کۆبوونەوە و هتد)، سوروساتچی 2 ڕێستورانگێڕ، خاوەن یا بەڕێوەبەری خواردنگە یا هوتێل ۞ 1 مسئول تدارک غذا 2 صاحب یا مدیر رستوران یا هتل

**catering** /ˈkeɪtərɪŋ/ *noun*
دابین‌کردنی خۆراک، ئامادەکردنی چێشت و خۆراک ۞ فراهم‌سازی غذا

**caterpillar** /ˈkætəpɪlə(r), US -tərp-/ *noun*
1 تەتڵەمیران، تەتەڵەمیران، دەروێشەمارە، کرمەدار، کایە، کرمی دار، کرماسۆرک، کرمی مێروو یان پەپوولە یان moth، کرمۆکە 2 زنجیر (بنەڕەت: لە *chatepelose* فەرەنسی کۆن "hairy cat") ۞ 1 کرم حشره یا پروانه 2 شنی

**caterpillar track** *noun*
(تانک، تراکتۆر و هتد) زنجیر ۞ زنجیر

**caterpillar tractor** *noun*
تراکتۆری زنجیردار یان زنجیری ۞ تراکتور زنجیردار

**caterwaul** /ˈkætəwɔːl, US ˈkætər-/ *noun*
زیکە، جیکە، قیژە، هاوار، هەرا، میاومیاو (caterwauling *n, adj*) ۞ جیغ، فریاد، میومیو

**catfacing** *noun*
رووپشیله: تێکچوونی میوه کە بە شێوەی پشیلەیە ◌ کاتفیسینگ
**catfight** *noun*
شەڕەپشیله: مشتومڕ و شەڕ ب.ت. لە نێوان دوو ژندا ◌ کاتفایت
**catfish** /ˈkætfɪʃ/ *noun, pl.* same or catfishes
نقە، باقوو، پشیلەماسی [دەستە Siluriformes: زۆر جۆرن] ◌ گربەماهی
**catgut** /ˈkætgʌt/ *noun*
1 ژێ، ریخۆڵـە(ی باهەڵدراو) 2 (پزشکی) دەزووی تەقەڵ 3 رووەکێ کە لە ئەمریکا دەڕوێ [*Tephrosia virginiana*] ◌ 1 زه 2 و 3 کاتگوت
**Cath** *abbreviation* 1 Catholic 2 Cathedral
**Cathar** /ˈkaθɑː/ *noun, pl.* Cathars or Cathari /-ri/
ئەندامی تیرەی جیاباوەڕانەی کریستانی سەدەکانی نێوەڕاست ◌ کاتار
**Catharism** *noun*
کاتاریزم ◌ کاتاریسم
**Catharist** *noun, adjective*
*n* کاتاریست *adj* کاتاریستی ◌ *n* کاتاریست *adj* کاتاریستی
**catharsis** /kəˈθɑːsɪs, US -ˈθɑːrs-/ *noun, pl.* catharses
1 دەروونپاکردنەوە، دەروونپالێوی (ئازادکردنی هەست و کوڵوکۆی بەهێز بەرێگای کاریگەری هونەر ب.ت. دراما) 2 خاوێنکردنەوە، پاککردنەوە، بەتاڵکردن (ریخۆڵە) ◌ 1 تخلیه‌ی هیجانی 2 تحلیه
**cathartic** /kəˈθɑːtɪk, US -ˈθɑːrt-/ *adjective, noun*
*adj* دەروونپالێوییانە، پێوەندی بە دەروونپالێوییەوە هەیە: *a* ◊ *cathartic drugs* *It was a cathartic* ◊ *cathartic experience* *n experience* دەرمانی رەوانی، purgative
cathartically /kəˈθɑːtɪk(ə)li, US -ˈθɑːrt-) *adv* /) ◌ *adj* وابسته به تخلیه‌ی هیجانی *n* مسهل
**cathead** *noun*
کەللەپشیله، سەرەپشله (- لەسەر کەشتی بۆ بەرزکردنەوە یان هەڵگرتنی لەنگەر) ◌ کاتهد
**cathectic** /kəˈθɛktɪk/ *adjective*
سەربە هۆشپێدانی (تاپەسندی) دەروونی یان وزەی دەروونی ◌ وابسته به تمرکز روانی یا انرژی روانی
**cathedra** /ˈkæθɪdrə/ *noun*
تەخت، کورسی، تەخت یان کورسی ئۆسقۆفی ◌ مسند، کرسی، کاتدرا
**cathedral** /kəˈθiːdrəl/ *noun, adjective*
کلیسەی سەرەکی دیۆسێس لەژێر چاودێری گەورەقەشە، سەرکلیسە؛ پێوەندیدار بە cathedra (بنەڕەت: لە late *cathedralis* Latin لە *cathedra* لاتین "تەخت، کورسی"، لە *kathedra* یۆنانییەوە) ◌ کلیسای جامع
**Catherine wheel** /ˈkæθrɪn wiːl/ *noun*
کەلەبێژنگ، ئالقەی ئاگرین، بازنەی ئاورین ◌ ترقه‌ی چرخنده
**catheter** /ˈkæθɪtə(r)/ *noun*
میل، لوولە، میزڕاگوێز، شلەبەر (لوولەیێ لەنێو لەش دادەنرێ بۆ لابردنی شلە و میز) ◌ سوند
**catheterization** /ˈkæθɪtə(r)/ *noun*
میلتێخستن، لوولەدانان، میلدانان (وەک لە نێو میزەڵدان bladder، قورقوڕاگە trachea و دل) ◌ (عمل) سوندگذاری
**cathetometer** /ˌkaθɪˈtɒmɪtə/ *noun*
کاسێتۆمیتر ◌ کاستومتر
**cathexis** /kəˈθɛksɪs/ *noun, pl.* cathexes
(دەروونشیکاری) هۆشپێدانی (تاپەسندی) دەروونی، وزەی دەروونی (بنەڕەت: لە *kathexis* یۆنانی "retention"، وەرگێڕدراوی *Libidobesetzung* ئەڵمانی، لە لایەن فرۆیدەوە داڕێژراوە) ◌ تمرکز روانی، انرژی روانی
**cathode** /ˈkæθəʊd, US -oʊd/ *noun*
زێرک(ە)، کاتۆد، جەمسەری سارد یان نەرێنی (دژی anode) ◌ کاتود
**cathode ray** *noun*
تیشکی زێرکی یان کاتۆدی ◌ پرتو کاتودی
**cathode-ray tube** *noun*
گلۆپی (بۆشایی) تیشکی زێرکی یان کاسۆدی ◌ لامپ پرتو کاتودی
**cathodic** /kəˈθɒdɪk/ *adjective,* also cathodal
کاسۆدی، زێرکی، زێرکەیی، کاتۆدیک ◌ وابسته به کاتود
**cathodic polarization** *noun*
جەمسەرگری کاتۆدی ◌ قطبش کاتودی
**cathodic protection** *noun*
پاراستنی کاتۆدی ◌ حفظ کاتودی
**cathodic reaction** *noun*
کاردانەوەی کاتۆدی ◌ واکنش کاتودی
**catholic** /ˈkæθlɪk/ *adjective*
1 بەرین، بەرفرەهـ، بەربڵاو 2 گشتلایەنە، گشتی، هەمەلایەنە، گشتگر، گەلەمپەری 3 جۆراوجۆر 4 بیرکراوە، کراوە، بیرفرەهـ ◌ 1 گسترده 2 همگانی، جامع 3 گوناگون 4 آزادمنش
**Catholic** /ˈkæθlɪk/ *noun,* also Roman Catholic
کاتۆلیک، کاسۆلیک، ئەندامی کلیسەی کاتۆلیکی رۆم ◌ کاتولیک
**Catholic Apostolic** *adjective*
سەربە تیرەیێکی کریستیەن دامەزراو لە سەدەی

نۆزدەیەم لە ئینگلتەرە ◌ آپوستولیک کاتولیک
**Catholic Epistles** *noun, pl.*
نامە یان نامیلکەکانی کاتۆلیک: پێنج نامەی پەیمانی نوێ کە بریتین لە: Peter James ی یەکەم و دووەم، John ی یەکەم و Jude ◌ رسالەهای کاتولیک
**catholicism** /kəˈθɒləsɪzəm, US -θɑːlə-/ *noun*
ئایینزای کاسۆلیک ◌ مذهب کاتولیک
**catholicity** /ˌkæθəˈlɪsətɪ/ *noun*
1 هەمەلایەنیتی، گشتگری، گشتگیری، بەربلاوێتی، گشتێتی، بەرفرەهی 2 بیرکراوەیی، بیرفرەهی ◌ 1 فراگیری، جامعیت 2 آزادمنشی
**Catholicity** /ˌkæθəˈlɪsətɪ/ *noun*
کاتۆلیسیتی ◌ آیین کاتولیک
**catholicon** /kəˈθɒlɪkɒs/ *noun*
نۆژدارو، دەرمانی هەموو دەردێ ◌ نوشدارو
**Catholicos** /kəˈθɒlɪkɒs/ *noun, pl.* Catholicoses /kəˌθɒlɪˈkəʊsiːz/ or Catholicoi /kəˈθɒlɪkɔɪ/
سەرقەشەی کلێسەی ئەرمەنی یا نێستۆری ◌ کاتولیکاس
**catholic philosophy** *noun*
فەلسەفەی کاسۆلیکی ◌ فلسفەی کاتولیکی
**cathouse** *noun*
(نافەرمی و ئەمریکا) قاحبەخانە، حیزخانە، bordello ◌ فاحشەخانە
**cation** /ˈkætaɪən/ *noun*
کاتیۆن (ئایۆنی بارگاوی ئەرێنی، دژی anion) ◌ کاتیون
**cationic** /katʌɪˈɒnɪk/*adjective*
کاتیۆنی، سەربە یان پێوەندی بە کاتیۆنەوە هەیە ◌ کاتیونی
**catkin** /ˈkætkɪn/ *noun*
هێشووەگوڵی شۆڕەوەبوو، کلکپشیلەیی (گوڵی جوانی، وەک هی داربی و فندق) ◌ آرایش نگینی، دمگربەای
**catlike** /ˈkætlaɪk/ *adjective*
پشیلەئاسا، شێوەپشیلە، پشیلەیی، کتکی ◌ گربەمانند
**catling** /ˈkætlɪŋ/ *noun*
1 بەچکەپشیلە، بێچووەکتک 2 ژێ ◌ 1 بچە گربە 2 زه
**catlinite** /ˈkatlɪnʌɪt/ *noun*, from Amer. artist George Catlin
گڵە سوورەی ناوچەی میسۆری ژووروو، گڵەسەبیلە pipestoneی پیرۆزی سوورپێستەکان ◌ کاتلینیت
**catmint** /ˈkætmɪnt/ *noun*, also catnip /ˈkætnɪp/
(رووەکناسی) گیاکتک، سونبولەتیف؟، گوڵەخەو [Nepeta cataria و جۆرە پێوەندیدارەکان] ◌ علف گربه
**batnap** /ˈkætnæp/ *noun*
وەنەوەز، خەوەنوچکە، کەرویشکەخەو، خەوبردنەوە ◌ چرت
**cat-o'-nine-tails** /ˌkæt ə ˈnaɪn teɪlz/ *noun*
(مێژوویی) شێلاق، جەلدە، قەمچی، نۆسەرە، نۆسەرک (بە نۆ گرێوە) ◌ تازیانه
**catoptric** /kaˈtɒptrɪk/ *adjective*
سەربە ئاوێنە یان پەرچانەوە، ئاوێنەیی ◌ وابسته به کاتوپتریک
**catoptrics** /kəˈtɑːptrɪks/ *noun, pl.*
زانستی پەرچانەوە یا دانەوە (بنەرەت: لە katoptron یۆنانی "ئاوێنە") ◌ کاتوپتریک
**cat's-cradle** *noun*
1 شریتێن، قانگلێن؟، پەتپەتێن، پەتێن (جۆرێ کایە و شێوەی جۆراوجۆری پێ دەردەهێنن) 2 a cat's cradle of: شتێکی ئاڵۆز و پێچەڵاوپێچ: red tape ◌ 1 برچینک 2 چیز پیچیده
**cat scratch disease** *noun*, also cat scratch fever
نەخۆشی یا تای رنینی پشیلە، جۆرێ نەخۆشی کە لەودا ماسینی lymph gland ەکان، تا و بایەری بە دواوەیە و بەهۆی بەکتریێکەوە [Bartonella henselae syn. Rochalimaea henselae] ◌ نوعی بیماری
**cat's ear** *noun*, cat's ears
(رووەکناسی) گوێپشیلە [تۆخم Hypochaeris] ◌ نوعی گیاه
**cat's-eye** *noun*
1 چاو(ە)پشیلە: ناوی چەندین بەردی بەنرخ (وەک chrysoberyl یان chalcedony) کە رووناکی ئەدەنەوە 2 (ریگا) چاو(ە)پشیلە ◌ چشم گربه
**Catseye** /ˈkætsaɪ/ *noun*
(دروشمی بازرگانی، بریتانیا) سنگ یان بزماری چاوپشیلەیی (لەنێوەراستی ریگادا دەدرەوشێتەوە) ◌ میخ چشمگربەای
**cat's foot** *noun*
پێپشیلە، چەپۆلەشێرە، لە خێزانی daisy [Antennaria dioica] ◌ نوعی گیاه
**cat's paw** *noun, pl.* cat's paws
1 ساویلکە، داری دەست، ئامێر، کایەی دەست، دەسکەلا، dupe 2 چنگەپشیلە (گرێ) 3 چرنووک یا چنگی پشیلە ◌ 1 آلت دست 2 و 3 کتس پاو
**cat suit** /ˈkætsuːt, US -sjuːt/ *noun*
(بەرگ) یەکسەرەی تەنگ، فەرمانەی تەنگ، قەسری ◌ سرهمی چسبان
**catsup** /ˈkatsəp/ *noun*
سۆسی باینجان، ketchup ◌ سس گوجەفرنگی

**cattail** *noun*
(رووەک‌ناسی) کلکەپشیلە، گیامەترەق، کەرەپوو، لوو [توخم *Typha*]، لە خێزانی cattail، ب.ت. *T. latifolia*، بە گەڵای شمشێرئاسای درێژەوە کە بۆ دروستکردنی حەسیر و شتی وا بەکاردێنرێ و هێشووە گوڵی وردی لوولەکی‌یەوە قاوەیی هەیە ◌ کت‌تایل

**cattail family** *noun*
خێزانی کلکەپشیلە یان کەرەپوو: خێزانی Typhaceae، کۆمەڵە گیایێکی زەلکاوی ناداری، بە لاسک یان قەدی ڕاست و درێژ و هێشووە گوڵی چڕەوە ◌ کاتایل فامیلی

**cattalo**, *pl.* cattaloes or cattalos = beefalo

**cattery** /'kætəri/ *noun, pl.* catteries
شوێنی لێدانانی کاتەکی پشیلەکان ◌ کتری

**cat thyme** *noun*
(رووەک‌ناسی) دایکەوباوکە، دایەوباوە، میمنوخنە، می‌می‌خۆنی ◌ مریم‌نخودی، کلپوره

**cattish** = catty (cattishly *adv*; cattishness *n*)

**cattle** /'kætl/ *noun, pl.*
گاران، ڕەشەوڵاغ، گاگەل، مێگەلە وڵاخ، ناخر، پاتاڵ، ئاژەڵ، دەوڵەت [*Bos taurus* و جۆرەکانی تر، خێزان Bovidae] ◌ گلەی گاو، احشام

**cattle cake** *noun*
خۆراکی وڵاخ، تفاقی پاتاڵ ◌ خوراک دام

**cattle egret** *noun*
خەمەخۆرەی بەرگاران [*Bubulcus ibis*] ◌ نوعی حواصیل

**cattleman** *noun, pl.* cattlemen
وڵاخبەخێوکەر، وڵاخڕاگر، وڵاخدار ◌ گاودار

**cattle-grid** *noun*, also cattle-guard
(لە ڕێگا و هتد) نەردە، پەرژین ◌ نرده

**cattle market** *noun*
بازاڕی وڵاخفرۆشەکان ◌ بازار گاوفروش‌ها

**cattle-pest** *noun*
ئازاری وڵاخ ◌ طاعون گاو

**cattle plague** *noun*
پەتا یان ئازاری وڵاخ، گاقڕان ◌ طاعون گاو

**cattleya** /'katlıɔ/ *noun*
گیاسارمەی گەڵائەستووری گەرمێنانی ئەمریکا بە گوڵی گەورە و ئالاووالاوە [توخم *Cattleya*] ◌ نوعی گیاه

**catty** /'kæti/ *adjective* (cattier, cattiest)
1 ڕیایی‌باز، دووڕوو، ڕووبین 2 کیناوی، ڕقاوی، بوغزاوی 3 فێڵاوی، پیس، لەبنەوەبڕ (cattily *adv*: بە ڕق و کینەوە؛ cattiness *n*: 1 کیناوی بوون، ڕقلەزگ‌بوون 2 ڕیابازی 3 چەپەڵی، پیسی) ◌ 1 مزور 2 کینەتوز 3 حیلەگر

**catty-corner** *adjective*, also catty-cornered
قیچەلفاچ، لابەلا، کەش‌وتووش، لار، خوار، پلووچ ◌ مورب، مائل

**catwalk** /'kætwɔ:k/ *noun*
پشیلەڕێ، باریکەڕێ، تەنگەڕێڕەو ◌ گربەرو

**caubeen** /kɔ:'bi:n/ *noun*
(ئیرلەند) کلاو یان beret (بنەڕەت: چکۆلێنراوی *cába* "cape") ◌ کوبین

**Caucasian** /kɔ:'keızıən, US kɔ:'keıʒn/ *adjective, noun*
*adj* کەوکازی، سەربە کەوکاز (دابەش‌کردنێکی بەربڵاوی مرۆڤە کە ئەورووپا، ڕۆژاوای ئاسیا و چەند بەشێ لە هیندووستان و باکووری ئەفریکا دادەگرێ *n* خەڵکی کەوکاز ◌ *adj* قفقازی *n* اهل قفقاز

**Caucasoid** /'kɔ:kəsɔıd/ *adjective, noun*
*adj* سەربە دابەشاندنی کەوکازی مرۆڤ *n* کەوکازی ◌ قفقازی

**caucus** /'kɔ:kəs/ *noun, pl.* caucuses
1 ڕێبەران یان سەرکردەکانی حزبی، دانیشتن 2 کۆبوونەوە، جڤین 3 کۆنگرەی پارتی ◌ 1 سران حزب 2 جلسە 3 کنگرەی حزبی

**caudal** /'kɔ:d(ə)l/ *adjective*
1 کلکی، جووجکەیی، دووڤی، کلک‌ئاسا 2 نزیک بە کلک یان پاشەڵ یان بەشی پشتەوەی لەش (caudally /'kɔ:d(ə)li/ *adv*: لەباری کلکی‌یەوە، لەباری دووڤی‌یەوە) ◌ 1 دمی، وابستە بە دم 2 نزدیک بە دم

**caudal fin** = tail fin

**Caudata** /'kɔ:deıtə/ *pl.*, another term for Urodela

**caudate** /'kɔ:deıt/ *adjective*, also caudates
(توێکاری) کلک‌دار. کلکن، جووجکەدار (caudation *n*) ◌ دارای دم

**caudex** *noun, pl.* caudices or caudexes
کۆتەر(ە): 1 لاسک یان پەلی سەرەکی دار، ب.ت. هی خورما یان سەرەخس 2 بنکی ڕووەکی چەندساڵە perennial ◌ محور اصلی

**caudillo** /kaʊ'di:jəʊ, US -'di:ljəʊ/ *noun, pl.* caudillos
(وڵاتانی سپانیایی‌زمان) ڕێبەری ڕامیاری یان سەربازی (بنەڕەت: لە late Latin *capitellum*، چکۆلێنراوی *caput* "سەر") ◌ رهبر سیاسی یا نظامی

**caught** /kɔ:t/ = past and past participle of catch

**caul** /kɔ:l/ *noun*
1 پەردەهەناو، پەردەی منالدان یان ئاوەڵمناڵ 2 (توێکاری) خاو، خەو (پەردەی بەزی هەناو) 3 جۆرێ لەچکە 4 تۆڕی تاڵە جاڵجاڵووکە ◌ 1 مشیمە 2 ثرب 3 نوی روسری 4 شبکەی تار عنکبوت

**cauldron** /'kɔ:ldrən/ *noun*, also caldron
مەنجەڵ، قازان، دست، بڕۆش، خەزگان، نقرە ◌

دیگ، پاتیل
**cauliflower** /'kɒliflaʊə(r), US 'kɔ:li-, 'kɑ:li-/ *noun*
گوڵکەلەم، گوڵی کەلەم [ *Brassica oleracea botrytis*] ۞ گل کلم
**cauliflower cheese** *noun*
چێشتێکی گوڵکەلەم (لەنێو سۆسی پەنیر) ۞ نوعی غذا
**cauliflower ear** *noun*
گوێی گوڵکەلەمی یان شکاو (لەبەر لێکەوتنی مشت و لە وەرزشی زۆرانبازی و شەڕەمشتدا) ۞ گوش گل‌کلمی
**cauliflower with cheese** = cauliflower cheese
**cauliform** /kɔ:ləfɔ:m/ *adjective*
لاسکی، لاسک‌ئاسا، قەدئاسا، لەلاسک‌چوو ۞ ساقه‌ای
**cauline** /kɔ:laɪn, US -lɪn/ *adjective*
لاسکی (گەشەکردوو یان شینبوو (رووەک) لە بەشی سەرووی upper part قەد یان لاسکدا) ۞ ساقه‌ای
**caulis** *noun*
قەد، لاسک، ساقەت ۞ ساق
**caulk** /kɔ:k/ *noun*, also US calk
کەرەسە یان مەتریالی درزگر، کونبەندە، کونگرە ۞ ماده‌ی درزگیر
**causal** /'kɔ:zl/ *adjective*
1 هۆکاری، هۆیی، سەدەمی، هۆبەند، ئەگەری، سەربە یان پێوەندی بە هۆوە هەیە، دەرەنجامی هۆ، سەرهەڵداو یان پەیدابوو لە ئەنجامی هۆیێ: *the causal agent* ◊ *a causal development of a disease* 2 سەربە هۆ و هۆکرد 3 (ڕێزمان) هۆیی (causally /'kɔ:zli/ *adv*: بە شێوەیێکی هۆیی، هۆیی‌یانە: *Are the two factors causually connected?*) ۞ 1 علی 2 علت و معلولی 3 سببی
**causal action** *noun*
کردەوەی هۆیی ۞ فعل علی
**causal chain** *noun*
زنجیرەی هۆیی ۞ رشته‌ی علی
**causalgia** /kɔ:'zældʒə/ *noun*
تائێشە، گەرمائێشە، ژانەتا: ژانی سووتانێکی سەختی پەلەکان کە لەودا ئێش بە دەمار و نێرڤی دەوروبەر گەیشتووە (causalgic adj: تووشبوو بە تائێشە؛ بنەڕەت: لە *kausos* یۆنانی‌یەوە "heat, fever" + -algia) ۞ کوزالجیا
**causalism** *noun*
هۆباوەڕی، هۆگەری، هۆخوازی ۞ علت‌گرایی
**causality** /kɔ:'zæləti/ *noun*, also causation
1 هۆیێتی، هۆبەندی، هۆیەتی، بوونەهۆ 2 هۆکارێتی، بنەمای هۆیێتی (کە هیچ شتێ ناتوانێ بە بێ‌هۆیێ روویدا) ۞ 1 علیت 2 اصل علیت
**causal laws** *noun, pl.*
قانوونە هۆیی‌یەکان، زاگۆنە ئەگەری‌یەکان ۞ قوانین علی
**causal relation** *noun*
پێوەندی هۆیی ۞ رابطه‌ی علی
**causation** /kɔ:'zeɪʃn/ *noun*
1 هۆیێتی، هۆیەتی، بوونەهۆ، هۆکارێتی 2 بنەمای هۆیێتی 3 هۆ، مایە، ئەگەر 4 = causality ۞ 1 علیت 2 اصل علیت 3 علت، سبب
**causative** /'kɔ:zətɪv/ *adjective*
1 هۆیی، مایە، بەدی‌هێنەر، هۆکار، ئەگەر، مایەیی: *causative bacteria of cholera* ◊ *Smoking is a causative factor in several major diseases* 2 (ڕێزمان) هۆدەربڕ (ب.ن. *blacken* "ڕەش‌کردن، ڕەش‌داگێڕان، ڕەش‌کردنەوە"، causatively *adv*، بڕوانە inchoative و ergative) ۞ 1 مسبب، باعث، موجب 2 (دستور) سببی
**cause** /kɔ:z/ *noun*
1 هۆ، هۆکار، ئەگەر، سەدەم، مایە: *Unemployment is a major cause of poverty* 2 ماک، بنەما، دۆز، کێشە 3 بەڵگە 4 ئامانج، مەبەست 5 (ماف) داواکاری، دادخوازی (causeless /'kɔ:zləs/ *adj*: لەخۆوە، بەبێ‌هۆ، بەناحەق، بێ هیچ هۆیێ؛ causelessly /'kɔ:zləsli/ *adv*: بەناحەق، لەخۆوە، بێ‌هیچ شتێ) ۞ 1 علت، سبب، باعث، موجب 2 منشا، قضیه 3 دلیل 4 هدف، مقصود 5 (حقوقی) دعوا
**'cause** = informal because
**cause and effect** *noun*
هۆ و هۆکرد ۞ علت و معلول
**cause célèbre** /ˌkɔ:z se'lebrə/ *noun*
دادگایی یان داواکاری جەنجاڵی یان کێشەلەسەر، پرسێکی کێشەلەسەر کە سەرنجی گشتی ڕادەکێشێ ۞ محاکمه یا دعوای جنجالی
**causerie** /'kəʊzəri, French kozʀi/ *noun*
وتوویژ یان گفتوگۆی نافەرمی، کورتەوتار (بنەڕەت: لە *causer* فەرەنسی "لێدوان") ۞ گفت‌گوی غیررسمی، مقاله‌ی کوتاه
**causeway** /'kɔ:zweɪ/ *noun*
بەرزەڕێ (ب.ت. لە زەوی قوڕاوی و نزمدا: *The islands are linked by causeways and bridges*؛ causewayed *adj*: بەرزەڕێ‌دار) ۞ راه مرتفع
**causey** /'kɔ:zi, US -si/, *pl.* causeys = archaic term for causecay
**caustic** /'kɔ:stɪk/ *adjective, noun*
*adj* 1 سووتێنەر (مەتریالێکی کیمیایی) 2 تاڵ، ناخۆش، ڕەق، توند، توندوتیژ *n* ماک، کەرەسە یان مەتریالی سووتێنەر ( caustically /-kli/

تۆمەت، شەڵتاخ، بوختان، چەفتە 2 نرخ، بایی، قیمەت، حەق، حەقدەس، مز، کرێ 3 مەزاخ، خەرج، تێچوون 4 سەرپەرشتی، سەرپەرستی، چاودێری، سەخبیری، چاوبەسەری، سەرنج، بەرپرسایەتی 5 کۆنترۆڵ، مەهار، دەس‌بەسەراگرتن 6 قەرز 7 ئەرک، پەیور 8 هێرش، گوژمە، پەلامار 9 دەستوور، فەرمان 10 (چەک) تەقەک، پێتەق، خەرج 11 (ئێلیکتریسیتی) بارگ، بارگە، بار 12 (heraldry) نیشان یان بەرژەنگێ کە لەسەر قەڵغان یان سنگ دادەنرێ ◌ 1 اتهام، تهمت 2 قیمت، دستمزد 3 هزینه 4 مراقبت، سرپرستی، توجه، مسؤلیت، تصدی 5 مهار 6 بدهی 7 وظیفه 8 حمله 9 دستور 10 خرج (اسلحه) 11 بار 12 شارژ

**chaergable** /'tʃɑ:dʒəbl, US 'tʃɑ:rdʒ-/ *adjective*

1 شیاوی تاوانبارکردن، گوناهبار دەکرێ 2 شیاوی شوێن‌کەوتن یان بەدواکەوتن (بە گوناهی) 3 لەپێدان‌هاتوو، دەدرێتەوە، شیاوی دانەوە 4 باج‌لەسەر، بەرباج‌کەوتوو: *chargeable earnings/income* (charged *adj*) 1 پڕ لە، دارماڵی، سەرریژ لە 2 پڕەوەکراو (باتری) 3 بارگاوی، بارگەدار) ◌ 1 اتهام‌پذیر 2 قابل تعقیب 3 قابل پرداخت 4 قابل مالیات

**charge account** = credit account

**charge balance** *noun*

(کیمیا) هاوسەنگی بارگە، هاوکێشی بارگە ◌ موازنەی بار

**charge-capping** *noun*

(بۆ خەرج‌وباری گشتی) دیاری‌کردنی دوا(پین)رادە ◌ تعین سقف

**charge card** *noun*

کارتی باوەڕی ◌ کارت اعتباری

**chargé d'affaires** /ˌʃɑ:ʒeɪ dæ'feə(r), US ˌʃɑ:rʒeɪ dæ'fer/ *noun, pl.* chargés pronunc. same

(فەرەنسی) کاربژێر، کارڕاپەڕێن ◌ کاردار

**charged particle** *noun*

پارچۆلکە یان تەنۆلکەی بارگاوی، وردیلەی بارگەدار، پارچۆلکەی بارگەدار ◌ ذرەی باردار

**chargehand** /'tʃɑ:dʒhænd, US 'tʃɑ:rdʒ- / *noun*

سەرکار، سەرکرێکار ◌ سرکارگر

**charge nurse** *noun*

1 بەرپرسی بەش (نەخۆشخانە) 2 سەرنەخۆشیار ◌ 1 رئیس بخش 2 سرپرستیار

**charger**[1] /'tʃɑ:dʒə(r), US 'tʃɑ:rdʒ-/ *noun*

1 دەزگای پڕکردنەوە، شارژێر، بارگینە، پڕەک، بارگینەر، پڕێنە 2 ئەسپی شەڕکەر یان شەڕ ◌ 1 شارژر 2 اسب جنگی

**charger**[2] /'tʃɑ:dʒə(r), US 'tʃɑ:rdʒ-/ *noun*

دەوری گەورە، تەبسی یان پێش‌خوری زلە ◌ بشقاب بزرگ

**chargesheet** /'tʃɑ:dʒʃi:t, US 'tʃɑ:rdʒ-/ *noun*

بەڵگار یان دۆسیەی سەرەتایی (لە وێسگەی پۆلیس ئامادە کراوە) ◌ پروندەی مقدماتی

**chariot** /'tʃæriət/ *noun*

1 ئەرابە (بە دوو چەرخ یان پێچکەوە و بۆ شەڕ یان پێشبڕکێ لە زوودا) 2 (مێژوویی) جۆرێ کالیسکەی چوارچەرخە کە کورسی لە پشتەوە و هی کالیسکەوانیشی هەبوو 3 (وێژەیی) ئەرابە یا کالیسکەی سەرکەوتن یا بەشکۆ ( charioteer /ˌtʃæriə'tɪə(r), US -'tɪr/ *n*: ئەرابەوان، ئەرابەچی، ئەراباژۆ، کالیسکەوان، کالیسکەچی) ◌ 1 ارابه 2 گردونەی چهارچرخ 3 چاریوت

**charisma** /kə'rɪzmə/ *noun*

1 سەرهێزی، کاریزما، فەڕ، بەهرە، جەوهەر 2 جادوو، سام (بنەڕەت: لە *charisma* یۆنانی، لە "grace ,favour" *kharis*) ◌ 1 فر، کاریزما، موهبت 2 جذبه

**charismatic** /ˌkærɪz'mætɪk/ *adjective*

سەرهێز، فەرمەند، فەڕوەر، کاریزماتیک (charismatically /-ɪz'mætɪkli/ *adv*) ◌ فرەمند

**Charismatic** /ˌkærɪz'mætɪk/ *noun*

دیانی یان مەسیحی سەرهێز یان کاریزماتیک ◌ مسیحی کاریزماتیک

**charitable** /'tʃærətəbl/ *adjective*

1 خێرەوەمەند، چاکەکار، خێرخواز: *charitable institutions* 2 دڵسۆز، دەسگر، دڵگەورە، پشوودرێژ، سنگ‌فراوان، لێبوردە، هەڵکردە، بەدەهەندە، بەدڵ‌ودەروون 3 کۆمەڵ یان ڕێکخراوەیەکی خێرخوازی، کۆمەڵ یان ڕێکخراوەی یارمەتی (charitableness *n*; charitably /-bli/ *adv*) ◌ 1 نیکوکار، خیر 2 مهربان، دارای سعەی صدر، بامدارا، بخشندە 3 انجمن یا سازمان خیریه

**charity** /'tʃærəti/ *noun, pl.* charities

1 خۆشەویستی، دڵسۆزی، دڵگەورەیی، دڵفراوانی، پشوودرێژی، سنگ‌فراوانی، لێبوردەیی 2 چاکەکاری، دەسگرتن، خێرەوەمەندی، خێرخوازی، خێر، خێرات 3 یارمەتی، کۆمەک: *Do you give much to charity?* 4 ڕێکخراوە یان دامەزراوەی خێرخوازی (charity begins at home: تا فەرز وێستابێ سوننەت بەتاڵە؛ تا ماڵ بیهەوێ بۆ مزگەوت حەرامە (یان تا ماڵ بیهەوێ مزگەوت پێ ڕەوا نییە)؛ یەکەم خێش دووهەم دەروێش) ◌ 1 مهر، بلندنظری، سعەی صدر 2 احسان، نیکوکاری، صدقه 3 کمک 4 مؤسسەی خیریه

**charity shop** *noun*

دووکانی خێرخوازی ◌ مغازه‌ی خیریه

**charivari** /ʃɑːrɪˈvɑːri/ *noun*, also shivaree
هەراوهوریا، زەنازەنا، غەلبەغەلب، دەنگی تێکەڵوپێکەڵ ◌ هیاهو

**charkha** /ˈtʃɜːkə/ *noun*, also charka
(لە نیمچەوشکاری هێند) خەرەک، کلافە، پێچکەی رستن، چەرخی رستن (بنەرەت: لە *charka* ئۆردوو "spinning wheel") ◌ چرخ نخ‌ریسی

**charlady** /ˈtʃɑːleɪdi, US ˈtʃɑːr-/ *pl.* charladies = chawoman

**charlatan** /ˈʃɑːlətən, US ˈʃɑːrl-/ *noun*
1 چاوبەست، تەڵەکەباز، دەسبڕ 2 دوکتۆری درۆزن، پزشکەدرۆزنە یان دەسبڕ (charlatanism /ˈʃɑːlətənɪzəm/ *n*؛ charlatanry /ˈʃɑːlətənri/: چاوبەستی، تەڵەکەبازی، دەسبڕی) ◌ 1 شیاد 2 دکتر قلابی

**Charles's law** *noun*
(کیمیا) قانوونی چارلز یان شارل: ئەو قانوونە کە دەڵێ بارستایی گازێکی ئایدیاڵ لە پەستانی constant pressure یان گوشاری جێگیردا سەبارەت بە گەرمی یان تێمپراچێری رەهای absolute temperature یەکڕاست ڕێژەیی‌یە (بنەرەت: لە ناوی فیزیکزانی فەرەنسی Jacques A. C. *Charles*) ◌ قانون چارلز

**Charles's Wain** *noun*
(ئەستێرەوانی) گاورچ، گەورەورچ، Big Dipper ◌ دب اکبر

**Charleston** /ˈtʃɑːlstən, US ˈtʃɑːrl-/ *noun*
چارلێستون (سەما و هەڵپەرکێ‌یەکی کرژ، کە لە دەیەی 20 (1920)دا باو بوو) ◌ چارلستون

**charley horse** /ˈtʃɑːli hɔːs, US ˈtʃɑːrli hɔːrs/ = cramp

**charlie** /ˈtʃɑːli, US ˈtʃɑːrli/ *noun, pl.* charlies
1 بنیادەمی کەروگەوج 2 (بریتانیا و نافەرمی) سنگ یان مەمکی ژن 3 (نافەرمی) کۆکایین 3 (یان Charlie) وشەکۆدی دەرخەری پیتی C لە پێوەندی‌یە رادیۆیی‌یەکان ◌ 1 آدم احمق 2 پستان زن 3 کوکائین 4 چارلی

**charlock** /ˈtʃɑːlɒk/ *noun*
(رووەکناسی) گورمزە، گەرمەژن، تەرەوکە، ئاهووری، تێرپۆکە، وتوونەگیا، خەرتەڵە، گوڵەزەردە [*Sinapis arvensis*] ◌ خردل وحشی

**charm** /tʃɑːm, US tʃɑːrm/ *noun*
1 جوانی، دڵڕفێنی، چەلەنگی، سەرنجڕاکێشی 2 جادوو، نیرەنگ، ئەفسوون، تەلەسم، دیوبەند، نووشتە، چاچۆل (charmer /ˈtʃɑːmə(r), US ˈtʃɑːrm-/ *n*؛ charmingness *n*؛ charmless /-mləs, US -ləs/ *adj*: بێ‌گیان، بێ‌ڕۆح، بێ‌تام، قۆڕ، ناخۆش: *a charmless industrial town*؛ charmlessly /-mləsli, US -ləsli/ *adv*؛ charmlessness /-mləsnəs, US -ləsnəs/ *n*) ◌ 1 زیبایی، جذابیت 2 سحر، تعویذ

**charmed circle** *noun*
کۆمەڵ یان دەستەی دەسڕۆیشتوو، دەستەی بەدەسەلات (تایبەت): *the charmed circle of the senator's advisers* ◌ گروه متنفذ

**charmeuse** /ʃɑːˈmɜːz/ *noun*
پارچەیێکی نەرمی لەخوری بۆ کراس ◌ چارموز

**charming** /ˈtʃɑːmɪŋ, US ˈtʃɑːrmɪŋ/ *adjective*
جوان، نازدار، نازەنین، دڵبەر، دڵڕفێن، سەرنجڕاکێش، خوێن‌شیرین: *The cottage is tiny, but it's charming* ◊ *She's a charming person* ◊ *What a charming name* (charmingly /ˈtʃɑːmɪŋli, US ˈtʃɑːrmɪŋli/ *adv*: سەرنجڕاکێشانە، دڵڕفێنانە) ◌ زیبا، جذاب

**charnel** /ˈtʃɑːnl/ *noun*
قەبرستان: شوێنی هەڵگرتنی تەرم و ئێسکی مردووەکان ◌ مقبره، چارنل

**charnel house** /ˈtʃɑːnl haʊs, US ˈtʃɑːrnl/ *noun*
شوێنێ بۆ هەڵگرتنی تەرم و ئێسکی مردووەکان ◌ چارنل

**Charolais** /ˈʃærə(ʊ)leɪ/ *noun, pl.* same
جۆرێ رەگەزی مانگای گۆشتی سپی کەتە (لە ناوی *Monts du Charollais* چەند گرد و تەپێکی رۆژهەڵاتی فەرەنسە، جێگایێ کە ئەو رەگەزە لەوێ سەری هەڵداوە) ◌ چارولایس

**Charon** *noun*, Latin, from Greek *Charōn*
چارۆن، کارۆن: کوڕی Erebus لە میتۆلۆژی یۆنانی‌دا کە گیان و رۆحی مردووانی بەسەر رووباری Styx دا دەپەڕاندەوە ◌ چارون

**charophyte** /ˈkɑːrə(ʊ)fʌɪt, ˈkarə(ʊ)-, ˈtʃarə(ʊ)-/ *noun*
رووەکێ کە تیرەی stonewort دادەگری [دیڤیژن یان بەش Charophyta] (بنەرەت: *Charophyta* لاتینی نوێ، لە *Chara* (ناوی "رووەکەکان") + *phuta* (توخم) ◌ نوعی گیاه

**charpoy** /ˈtʃɑːpɔɪ/ *noun*
(هیندوستان) تەخت، چرپایە، چوارپایە (سووک) ◌ تخت‌خواب

**charr** /tʃɑː/ *noun*, also char, *pl.* same
جۆرێ ماسی کەشینەئاسای ئاوەشیرینەکانی باکووری یان دەریاکان [توخم *Salvelinus*: چەندین جۆرن] (رەنگە بنەرەتی سێلتی هەبێ) ◌ نوعی ماهی

**charred** /ˈtʃɑːd, US tʃɑːrd/ *adjective*
بەخەڵووزبوو، نیوەسووتاو، رەشەوەبوو، سووتاو، کۆتەڵەخەڵووز (charred stick): *the charred*

زغاڵ‌شده ◌ *remains of a burnt-out car*

**charro** /'tʃɑːrəʊ/ *noun. pl.* charros

کاوبۆ یان گاوانی مەکسیکی ◌ کابوی مکزیکی

**charry** /tʃɑːrɪ/ *adjective*

خەڵووزین، خەڵووزی، زووخاڵی، ڕەژی‌ئاسا ◌ زغالی

**chart** /tʃɑːt, US tʃɑːrt/ *noun*

1 نەخشە (ب. ب. لە دەریاوانی‌دا، بە ڕێگای دەریا یان هەواوە): *a weather chart* 2 هێڵکاری، دیاگرام، چارت 3 خشتە ◌ 1 نقشه 2 نمودار 3 جدول

**charter** /'tʃɑːtə(r), US 'tʃɑːrt-/ *noun, adjective*

*n* 1 دەستوور، فەرمان، بڕیار، بڵاونامە، ڕاگەیاندن‌نامە: *the European Union's the ◊ Social Charter of workers' rights* 2 دەستوورنامە: *United Nations Charter The Royal College received its charter as a university in 1967* 3 (فڕۆکە، کەشتی و هتد) کری: *a yacht available for charter* *adj* بەکری‌گیراو، دەربەست ◌ *n* 1 حکم، منشور، اساس‌نامه، نظام‌نامه 2 مجوز، پروانه 3 کرایه *adj* دربست

**chartered** /'tʃɑːtəd, US 'tʃɑːrtərd/ *adjective*

1 ڕێدراو 2 لێوەشاو 3 خاوەن دەستوورنامە، دەستوورنامەدار 4 بەکری‌دراو بۆ مەبەستێکی تایبەتی (فڕۆکە، کەشتی یان بەلەمێ) ◌ 1 مجاز 2 واجد صلاحیت 3 دارای پروانه 4 کرایه داده‌شده برای منظور خاصی

**chartered accountant** *noun*

ژمێریاری فەرمی یا لێوەشاو ◌ حساب‌دار رسمی

**charter flight** *noun*

فڕۆکەی بەکری‌گیراو ◌ هواپیمای دربستی

**charter member** *noun*

ئەندامی دامەزرێنەر یان بنەڕەتی ◌ عضو مؤسس یا اصلی

**charter party** *noun*

(پەیمان‌نامە یا) بڕیارنامەی کەشتی بەکری‌گیراو یان دەربەست ◌ قرارداد کشتی دربست

**Chartism** *noun*

شارتیزم (= بزووتنەوەیێ لە بریتانیا لە 1830دا بە مەبەستی چاکسازی و ریفۆرم لە بواری چینی کرێکار و خەڵک‌دا، بنەماکانی لە مانیفێستۆی *The People's Charter*دا دیاری‌کراوە) ◌ شارتیسم

**Chartist** *noun, adjective*

*n* شارتیست *adj* شارتیستی ◌ *n* شارتیست *adj* شارتیستی

**charist** *noun*

نەخشەکێش ◌ نقشه‌بردار

**charter member** = founder member

**charter plane** *noun*

فڕۆکەی بەکری‌گیراو یان دەربەستی ◌ هواپیمای دربستی

**chartreuse** /ʃɑː'trɜːz/ *noun*

1 لیکۆری زەرد یان سەوز 2 ڕەنگی زەرد یان سەوزی کاڵ، ڕەنگی سەوزی ئاماڵ زەرد ◌ 1 لیکور زرد یا سبز 2 رنگ سبز مایل به زرد

**the charts** *noun, pl.*

لیستەی حەوتووانەی پرفرۆش‌ترین تۆمارەکانی مۆزیکی پاپ ◌ چارتس

**charwoman** /'tʃɑːwʊmən, US 'tʃɑːr-/ *noun, pl.* charwoman

کارەکەر ◌ مستخدم زن

**chary** /'tʃeəri, US 'tʃeri/ *adjective* (charier, chariest)

ئاگادار، وشیار، بەمشوور، چاودێر، لەسەرهۆش (charily *adv*) ◌ محتاط، مراقب

**Charybdis** *noun,* Latin, from Greek

کاریبدیس، چاریبدیس یان شاریبدیس: گێژاوێکی کەنار (یا دوورگە)ی سیسیل، لە میتولۆژی یونانی‌دا بە شێوەی دێوێکی مێینە وێچوێنراوە ◌ چاریبدیس

**chase**[1] /tʃeɪs/ *noun*

1 شوێن‌هەڵگرتن، ڕاونان، بەدواکەوتن، بەدواداگەڕان، بەدواداچوون، شۆپاندن، دانەپەی 2 ڕاو، ڕاوگە، جێ‌ڕاو 3 خەندەک ◌ 1 تعقیب، جستجو 2 شکار، شکارگاه 3 خندق

**chase**[2] /tʃeɪs/ *noun*

1 کالیبر، تیرخۆر 2 شوێن یان کەندەکێ لە دیوار بۆ (تیا)دانانی شت لەوێ‌دا وەک لوولە 3 = furrow ,groove ◌ 1 کالیبر 2 چین

**chaser** /'tʃeɪsə(r)/ *noun*

1 هەڵکۆڵ 2 بەشوێن‌داگەڕ، ڕاونەر 3 ئەو ئەسپەی کە لە پێشبڕکێ‌دا بەسەر کۆسپەکان‌دا دەپەڕێ 4 فڕۆکەی ڕاونەر 5 (نافەرمی) ئەو ئەڵکۆلە گیرایەی کە دوای دەنکێکی ناگیراتر دەخورێتەوە ◌ 1 حکاک 2 تعقیب‌کننده 3 چاسر 4 هواپیمای شکاری 5 چاسر

**Chasid** /'xasɪd/ = Hasid

**Chasidism** /'xasɪdɪz(ə)m/ = Hasidism

**chasm** /'kæzəm/ *noun*

1 کەلەبەر، کەلێن، کەندر، کەنداڵ، کەندەلان، کەنەلان 2 جیاوازی زۆر، ناکۆکی، ناخۆشی یەکجار، کەلێن، کەلەبەر (chasmic *adj*: 1 کەلەبەردار، کەلێن‌دار 2 بە جیاوازی‌یەکی زۆرەوە) ◌ 1 شکاف 2 اختلاف بسیار

**chasse** /ʃas/ *noun*

لیکۆری دوای قاوە ◌ شاس

**Chasselas** /'ʃas(ə)lɑː/ *noun*

1 جۆری ترێ، بۆ خواردن یان مەی دەکرێ 2

مەی ئەو ترێیە (لە ناوی گوندێ نزیک بە Mâconی فەڕەنسە) ◌ شاس‌لاس

**Chassid** /'xasɪd/ = Hasid

**Chassidism** /'xasɪdɪz(ə)m/ = Hasidism

**chassis** /'ʃæsi/ *noun, pl.* same /-sɪz/

چوارچێوە، چێوە، لاشەبەست، لاشەبەند، پەیکەر، شاسی، داروبەند، لاشەی ماشێن، قاوخ (وەک تەلەفزیۆن و رادیۆ) ◌ شاسی، تنەی اتومبیل

**chaste** /tʃeɪst/ *adjective*

1 داوێن‌پاک، پاک، بەناموس 2 پارێزگار 3 سادە، نەرازاوە (chastely *adv*: داوێن‌پاکانە، پاکانە، بەناموسانە؛ chasteness /tʃeɪstnəs/ *n*؛ chastity /'tʃæstəti/ *n*: 1 (داوێن)پاکی، بەناموسی 2 سادەیی، نەرازاوەیی 3 تەنیایی، بێ‌جووتی) ◌ 1 عفیف، پاک‌دامن 2 متقی 3 بی آرایش

**chaste tree** *noun*, also agnus castus

تیروو، ئالەت [*Vitex agnus-castus*] ◌ بَنگَرو

**chastisement** /tʃæ'staɪzmənt, US 'tʃæstɪzmənt/ *noun*

تەمێ، لێدان، بیراز، تاشان، سزا، سەزا ◌ تنبیه

**chastity belt** *noun*

پشتێنی داوێن‌پاکی ◌ کمربند عفت

**chasuble** /'tʃæzjʊbl/ *noun*

عەبا، بالاپۆش، جبە (بێ‌قۆڵ کە قەشە لە ئاهەنگی شێوی خواوەندی‌دا لەبەری دەکا) ◌ ردای کاهن

**chat** /tʃæt/ *noun*

1 گاڵتەوگەپ، دەمەتەقێ، دووان، شۆخی، قسە، ئاخافتن، وت‌وویژ یا قسەی دۆستانە 2 چەنەدان، چەقەسرۆیی ◌ 1 گپ، صحبت، حرف 2 وراجی

**château** /'ʃatəʊ, French ʃato/ *noun, pl.* chateaux pronunc. same or /-təʊz/

1 سەرا، کۆشک، کاخ 2 کۆشکی سەردەمی دەرەبەگایەتی لە فەڕەنسە 3 قەڵا ◌ 1 کاخ، قصر 2 قصر دوران فئودالیته 3 دژ

**chatelain** /'ʃætleɪn/ *noun*

فەرماندەری قەڵا، قەڵادار ◌ فرماندەی قلعه

**chatelaine** /'ʃatəleɪn/ *noun*

1 خانمی کۆشک 2 زنجیر، زریزە، قولاپ (جوانی پشتێنە یان کەمەر، بۆ هەڵگرتنی کلیل یان شتی تر) ◌ 1 بانوی قلعه 2 زنجیر

**chatoyant** /ʃə'tɔɪənt/ *adjective*

بریسکەدار، ورشن (chatoyance or chatoyancy *n*: بریسکەداری، ورشنی، زریوەزریو) ◌ دارای درخشندگی متغیر

**chat show** *noun*

میزگرد، کۆبوونەوە، جڤین (تەلەفزیۆن و رادیۆ) ◌ میزگرد

**chat roon** *noun*

(ئینتێرنێت) دیوی گەپ و چەت ◌ اتاق چت

**chattels** /'tʃætlz/ *noun, pl.*

1 کەلوپەلی خۆ 2 بردەمەنی، ماڵ، دارایی، باروبنە، بارگەوبنە، کەلوپەل یان پێتاکی ناوماڵ، کالا، کەلەپوور، کەلوپەل، شمەک 3 کۆیلەکان ◌ 1 لوازم شخصی 2 منقول، کالا 3 بردگان

**chatter** /'tʃætə(r)/ *noun*

زۆربلەیی، چەقەسرۆیی، چەنەدان، قیژەقیژ، زیق‌وهەرا، گاڵەگاڵ، شەقەشەق، چۆقەچۆق: (chattery *n*؛ chatterer *n*: دان) *idle chatter* ◌ وراجی، جیغ و ویغ، تلق و تولوق

**chatterbox** /'tʃætəbɒks, US 'tʃætərbɑ:ks/ *noun*, also chatterer

بنیادەمی زۆربلە، زۆروەڕ، چەقەسرۆ (ب.ت. منال) ◌ آدم وراج

**chatty** /'tʃæti/ *adjective* (chattier, chattiest)

1 زۆربلە، زۆروەڕ، چەقەسرۆ 2 خۆمانە، دۆستانە (chattily /'tʃætɪli/ *adv*؛ chattiness /'tʃætɪnəs/ *n*) ◌ 1 وراج 2 دوستانه

**chat-wood** *noun*

ورکەدار، چیلکەوچاڵ، وردەئێزنگ ◌ خرده هیزم

**chauffeur** /'ʃəʊfə(r), US ʃoʊ'fɜ:r/ *noun*

(فەڕەنسی) شۆفێر، لێخوڕ (تایبەتی؛ chauffeuse *n*؛ chauffeured *adj*: شۆفێردار) ◌ راننده

**chaulmoogra** /tʃɔ:l'mu:grə/ *noun*

دارێکی هەمیشەسەوزی گەرمێنانی ئاسیا، بەر یان دەنکەکانی رۆنین و لە بواری پزشکی‌دا و هەروەها وەکوو preservative بەکاردێتێ [*Hydnocarpus kurzii*] (بنەڕەت: لە *cāul-mugrā* بەنگالی) ◌ نوعی درخت

**chausses** /ʃəʊs/ *noun, pl.*

(مێژوویی) بەرگێکی تەنگ بۆ لاق و پێ، ب.ت. ئەوەی کە بەشێ لە زرێی شۆڕەشواری پێکدێنێ ◌ شوس

**chautauqua** /tʃɔ:'tɔ:kwə, ʃ-/ *noun*

(لە ئەمریکای باکووری) دامەزراوەیێ کە لە دوایی‌یەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم باری پەروەردەی گشتی دابین دەکرد و هەروەها لایەنی سەرگەرمی و ئێنتێرتەینمێنتیشی (بە شێوەی کۆنسێرت، وتاردان و هتد) تیابوو (بنەڕەت: لە ناوی دەریاچەی *Chautauqua*) ◌ چوتوکوا

**chauvinism** /'ʃəʊvɪnɪzəm, US 'ʃoʊ-/ *noun*

1 رەشەنیشتمان‌پەروەری، کوێرەنیشتمان‌پەرستی، نیشتمان‌پەرستی، شۆڤینیزم، نیشتمان‌پەروەری دەرمارگرژانە 2 (هەروەها male chauvinism) پیاوسالاری، لایەنگری سەرتری پیاوان، باوەڕێ کە پێی وایە ژنان لە (چاو) پیاوان کەم‌ترن (chauvinist /'ʃəʊvɪnɪst/ *n, adj*: 1 رەشەنیشتمان‌پەروەر، نیشتمان‌پەرست،

*adj* نیشتمانپەروەری دەرمارگرژ 2 دەمارگرژ نیشتمانپەرستانە، نیشتمانپەروەرانە؛ **chauvinistic** /ˌʃəʊvɪˈnɪstɪk, US ˌʃoʊ-/ *adj*: دەمارگرژانە، کویرکویرانە، توندرەو، ریبازگرژ، لە رووی دەمارگرژی نیشتمانییەوە؛ **chauvinistically** /-kli/ *adv*: دەرمارگرژانە، بەشێوەیێکی ریبازگرژ، نیشتمانپەرستانە، نیشتمانپەروەرانە)؛ بنەرەت: لە ناوی Nicolas *Chauvin*، (کۆنە) سەربازێکی سپای ناپۆلیۆن Napoleon's army، جێی سەرنجە بۆ نیشتمانپەروەری توندرەوانەی) ◌ 1 میهنپرستی تعصبآمیز 2 مردسالاری

**chaw-bacon** *noun*

مرۆی کەر، بێمێشک ◌ آدم الاغ

**chayote** /ˈtʃeɪəʊti/ *noun*

1 میوەیێکی گۆشتنی گەرمێنان لە تامدا شێوەی خەیار دەدا 2 دارمێویکی گەرمێنانی ئەمریکایی کە ئەو بەرە دەگرێ [*Sechium edule*] ◌ چایوتی

**ChB** /ˌsiː eɪtʃ ˈbiː/ *abbreviation* Bachelor of Surgery

بەکالیۆری برینکاری یان نەشتەرگەری ◌ کارشناس عمل جراحی

**cheap** /tʃiːp/ *adjective, adverb*

*adj* 1 هەرزان، کەلەبوور، مەلاخۆرە، هەرزانبایی، بازاری، رەشۆکی، کەمبایی، خۆرایی، مفت، تالانی، ئاشاخە، گەنوگوو، ئایەخ، قرپۆک، هیچ، بێنرخ، بەکارنەهاتوو، خراپ، ناکەس، سووک، چرووک، گناس، هەرزە، ناحەز، ناشیرین: *Cycling is a cheap way to get around* ◊ *cheap fares* 2 بێرەوشتانە، بێریزانە 3 رژد، بەرچاوتەنگ، لەچەر 4 دووروو، رووبین 5 مفتە *adv* هەرزان، بە نرخێکی کەم (*adj* **cheapish**؛ **cheapishli** *adv*؛ **cheapness** *n*) ◌ *adj* 1 ارزان، مفت، بنجل، بیارزش، پست، هرزه 2 بیادبانه 3 خسیس 4 ریاکار 5 باداورده *adv* به قیمت ارزان

**cheap-jack** *noun, adjective*

*n* ئایەخفرۆش، گەندفرۆش *adj* بازاری، خراپ، قرپۆک، رەشۆکی، ئایەخ، ئاشاخە ◌ *n* بنجلفروش *adj* بنجل

**cheaply** /ˈtʃiːpli/ *adverb*

بە نرخێکی کەم، مفت، بەشێوەیەکی هەرزان: *a cheaply made movie* ◊ *You can live very -y in Italy* ◌ به قیمت ارزان، به طور ارزان

**cheapo** /ˈtʃiːpəʊ, US -poʊ/ *adjective*

(نافەرمی) ئاشاخە، ئایەخ، رەشۆکی، بازاری، گەنوگوو، خراپۆکە، قرپۆکە، هەرزان، cheap: *cheapo CD players* ◌ بنجل، ارزان

**cheapskate** /ˈtʃiːpskeɪt/ *noun*

(نافەرمی) مرۆی بەرچاوتەنگ و رژد، ئایەخ کڕ، هەرزانکڕ ◌ آدم خسیس

**cheat** /tʃiːt/ *noun*

1 بنیادەمی گزەون، دەسبڕ 2 گزەونی، گزە (**cheatery** /tʃiːtəri/ *n*: گزەونی، گزیکاری، دەسبڕی، فێل، گزی، گزە؛ **cheating** *n*: گزیکاری، گزەونی، گزی، دەسبڕی، گزە) ◌ 1 آدم متقلب 2 تقلب

**cheater** *noun*

1 مرۆی گزەون، دەسبڕ، فێلەباز، قومارباز، گزیکار 2 (cheaters) جووتێ عەینەک یان عەینەکی بەرخۆر ◌ 1 آدم متقلب 2 چیترز

**cheat grass** *noun*, also cheatgrass

پەرشەکەبژار؟ [*Bromus tectorum* و جۆرەکانی تر] ◌ جاروعلفی بامی

**Chechen** /ˈtʃetʃen/ *noun, pl.* same or Chechens

1 ئەندامی گەلی مسوڵمانی دانیشتووی چیچنیا Chechnya (کۆمارێکی خۆبەرێوەبەرە لە رووسیەی رۆژاوای باشووریدا) 2 زمانی کەوکازی باکووری ئەو گەلە ◌ چچن

**check**[1] /tʃek/ *noun*

1 بەسەرداچوونەوە، چاوپیاخشاندنەوە، چاولێکردنەوە، پیاهاتنەوە، چاوپیاگێرانەوە، پشکنین، تێروانین 2 پێک گرتن، بەراوردکاری، هەڵسەنگاندن، بەریەکدان 3 تاقیکردنەوە 4 چاودێری، زێرەڤانی، کەتوانی، دەسبەسەراگرتن، راگیرکاری، کۆنترۆڵ، مەهار 5 نەهێشتن، پێش گرتن، پێشگیری، رێگرتن 6 وێستان، هەڵوەستە 7 قەڵەش، کەلێن 8 کەمبوونەوە، هاتنەخوارەوە 9 هۆکاری رێگر، راگیرکەر 10 کیش (شەترەنج) 11 حەوتک (√) 12 (لە ئەمریکا) چێک 13 پسوڵە، لیستە ◌ 1 بازبینی، وارسی 2 تطبیق 3 تست 4 نظارت، مهار 5 منع 6 وقفه 7 شکاف 8 کاهش 9 عامل کنترلکننده 10 کیش (شطرنج) 11 تیک 12 چک 13 صورتحساب

**check**[2] /tʃek/ *noun, adjective*

*n* 1 نموونە یان پاتێرنی شەترەنجی (شێوەی checkerboard دەدا) 2 پارچە یان جلوبەرگی خانەخانە، پارچەی شەترەنجی *adj* شەترەنجی، خانەخانە ◌ *n* 1 طرح پیچازی 2 لباس یا پارچەی پیچازی *adj* پیچازی

**check**[3] = US spelling of cheque

**checkbook** − chequebook

**checked** /tʃekt/ *adjective*

خانەخانە، شەترەنجی، چوارخانە: *checked material* ◌ پیچازی

**checker** /ˈtʃekə(r)/ *noun*

1 (کامپیوتێر) چاودێر، کۆنترۆڵکەر، چێکێر 2 بەرنامەی چاودێر 3 سنووقداری سوپێرمارکێتێ ◌ 1 مأمور کنترل 2 و 3 چکر

**checkerberry** *noun, pl.* checkerberries

1 دەوەنێکی shrub ئەمریکای باکووری

همیشەسەوزی evergreen خەشۆکی گەلابۆن‌خۆش، بە گوڵی سپی مێوی‌یەوە waxy [*Gaultheria procumbens*] 2 بەری سووری خۆراکی ئەو گیایە ◇ نوعی گیاه

**checkerboard** /ˈtʃekəbɔːd, US ˈtʃekərbɔːrd/ *noun*
تەختەدامە، تەختەشەترەنج ◇ صفحەی شطرنج

**checkered** = chequered

**checkers** /ˈtʃekəz, US -ərz/ *noun*, US draughts
دامە (یاری‌یێکی دوو کەسە، 24 داشی هەیە) ◇ بازی درافت، چکرز

**check-in** *noun*
1 پشکنین 2 شوێنی پشکنین (لە فڕۆکەخانە، پێش فڕین): *The airline apologizes for long delays at check-ins today* ◇ 1 بازرسی 2 محل بازرسی

**checking account** = current account

**checklist** /ˈtʃeklɪst/ *noun*
لیست (ئەو کارانەی دەبێ بکرێن): *a checklist for proofreaders* ◇ فهرست

**check mark** *noun*
نیشانەی حەوتک (√) ◇ علامت تیک

**checkmate** /ˌtʃekˈmeɪt, US ˈtʃekmeɪt/ *noun*
1 (هەزوەها mate) مات، کیش‌ومات 2 بەزین، تێشکانی بە تەواوی یان یەکجارەکی ◇ 1 مات 2 شکست کامل

**checkout** /ˈtʃekaʊt/ *noun*
1 مێزی پێدان (پارە): *long queues at the checkouts* 2 کاتی چۆڵکردنی ژوور (لە هوتێل) ◇ 1 صندوق 2 زمان تحویل اتاق

**checkpoint** /ˈtʃekpɔɪnt/ *noun*
بەربەست یا کۆسپی پشکنین، شوێنی پشکنین، پشکنینگە: *There are border guards at the checkpoint crossing* ◇ ایست بازرسی

**checkroom** /ˈtʃekruːm, US -rʊm/ = cloakroom

**checks and balance** *noun*
(رامیاری) چاودێری و هاوسەنگی ◇ نظارت و موازنه

**check-up** *noun*
تێڕوانین، دەویان: *a dental/routine/thorough a medical ◊ check-up* ◇ معاینه

**Cheddar** /ˈtʃedə(r)/ *noun*, also chedar
چێدار (= جۆری پەنیری زەردی رەق، لە Chedarی باشووری رۆژاوای ئینگلتەرە دەگیرێ) ◇ چدار

**Cheddar cheese** = Cheddar

**cheder** /ˈxedə/ *noun*, also heder, *pl.* chedarim /-ˈdɑːrɪm/, cheders
خوێندنگای منالانی جوولەکە کە لەودا زمانی عیبری و زانیاری ئایینی دەوترێتەوە (لە *heder* عیبری "ژوور، دیو") ◇ چدر

**cheechako** /tʃiːˈtʃɑːkəʊ/ *noun*, *pl.* cheechakos
(نافەرمی) تازەکار، نۆکار tenderfoot، ب.ت. لە ئالاسکا ◇ تازەوارد

**cheek** /tʃiːk/ *noun*
1 کولمە، گۆنا، گووپ، روومەت: *chubby/rosy/pink cheeks* 2 سمت، باشل 3 رووشری، بێ‌حەیایی، روو (بەرەتی ئەڵمانیای رۆژاوای هەیە) ◇ 1 لپ، گونە 2 لمبر 3 وقاحت

**cheekbone** /ˈtʃiːkbəʊn, US -boʊn/ *noun*
ئێسکی روومەت یان کولمە، سەرکولم ◇ استخوان گونە

**cheeky** *adjective* (cheekier, cheekiest)
بێ‌حەیا، روودار، رووهەڵماڵراو، impudent، irreverent (*adv*: **cheekily** /tʃiːkɪli/ بە روودارانە، رووهەڵماڵراوانە؛ **cheekness** /tʃiːkɪnəs/ *n*: بێ‌شەرمی، بێ‌حەیایی، رووداری) ◇ وقیح، پررو

**cheep** /tʃiːp/ *noun*
جیکەجیک، زروکەزروک، زروکە ◇ جیک‌جیک

**cheer** /tʃɪə(r), US tʃɪr/ *noun*
1 دەربڕینی کوڵوکۆ، هاندان، قریوە، های گیان، هاوار و قیژەی خۆشی 2 شادی، خۆشحاڵی، دڵگەرمی، ورە ◇ 1 ابراز احساسات، تشویق، هورا 2 نشاط، روحیه

**cheerful** /ˈtʃɪəfl, US ˈtʃɪrfl/ *adjective*
شاد، بەنەشە، خۆشحاڵ، گەش، رووشیرین، دڵگەرم، دڵشاد، دڵخۆش، بەکەیف، بەدەماخ، بەگوڕ، تامەزرۆ، بەپەرۆش، خۆش (**cheerfully** /-fəli/ *adv*: بە پەرۆشی؛ **cheerfulness** *n*: شادی، دڵخۆشی، خۆشحاڵی، بەگوڕی، بەدەماخی، خۆشی، بەپەرۆشی، تامەزرۆیی) ◇ بشاش، خوشحال، مشتاق، خوشایند

**cheering** /ˈtʃɪərɪŋ, US ˈtʃɪrɪŋ/ *noun*, *adjective*
*n* دەربڕینی کوڵوکۆ *adj* هاندەر، ورەپێدەر، هیواپێدەر، دڵخۆشکەر ◇ *n* ابراز احساسات *adj* تشویق‌کننده، امیدبخش

**cheerio** /ˌtʃɪəriˈəʊ, US ˌtʃɪriˈoʊ/ *interjection*
(بریتانیا و نافەرمی) خودات لەگەڵ!: *Cheerio now* ◇ خداحافظ!

**cheerleader** /ˈtʃɪəliːdə(r), US ˈtʃɪrl-/ *noun*
سەردەستەی هاندەران ◇ سردستەی تشویق‌گران

**cheerless** /ˈtʃɪələs, US ˈtʃɪrl-/ *adjective*
بەخەم، خەمبار، کۆلیل، کز، مات، دڵتەنگ، gloomy، depressing، bleak، joyless: *a cheerless room*؛ **cheerlessly** *adv*

**cheerlessness** *n* پــەژارەداری، خــەمباری، کزی، دڵتەنگی، کۆلیلی) ◌ اندوهبار، حزین
**cheers** /tʃɪəz, US tʃɪrz/ *interjection*
1 خوات لەگەڵ 2 بە خۆشی، بە سلامەتی (لە خواردنەوەدا) 3 سپاس، دەس‌خۆش، دەست خۆش بێ ◌ 1 خداحافظ 2 به سلامتی 3 ممنون
**cheery** /'tʃɪəri, US 'tʃɪri/ *adjective* (cheerier, cheeriest)
شــاد، دڵــشاد، خــۆش، بەکــەیف، دڵــگەش، خۆشحاڵ، بەدەماخ، بەگوڕ ( **cheerily** /'tʃɪərəli, US -li/ *adv*: بەبەرۆشــەوە، تامەزرۆیانــە، بەتاســەوە، بــە خۆشــییەوە، بــە دڵخۆشییەوە؛ **cheeriness** *n*) ◌ بانشاط، بشاش، مسرور
**cheese** /tʃi:z/ *noun*
1 پــەنیر، قاڵــب یــان قاڵبی پــەنیر، ســەلک: *a chunk/piece/slice of cheese* 2 جۆرێ مرەبا یان خۆشاو کە وەک پەنیری نەرم خوراگرە: *lemon cheese* ◌ 1 پنیر، قالب پنیر 2 نوعی مربا
**cheeseboard** /'tʃi:zbɔ:d, US -bɔ:rd/ *noun*
پنەی پەنیر، تەختەی پەنیر (قاش‌کردن یان برین) ◌ تختەی پنیربری
**cheeseburger** /'tʃi:zbɜ:gə(r), US -bɜ:rg-/ *noun*
پەنیربێرگێر، هامبێرگێری پەنیر ◌ چیزبرگر
**cheesecake** /'tʃi:zkeɪk/ *noun*
1 کەیکی پەنیر، پەنیرکەیک 2 وێنەی رووت ◌ 1 کیک پنیر 2 عکس لختی
**cheesecloth** /'tʃi:zklɒθ, US -klɔ:θ/ *noun*
پارچەی پەنیری (لە بنەڕەتا بۆ تێوەپێچانی پەنیر بەکاریان‌دێنا)، پەنیرپێچ، مەخمەر ◌ پارچەی پنیری
**cheesed off** *adjective*
1 دڵ‌هەڵــکەوتوو، بێــزار، بێــزراو 2 مانــدوو، شەکەت ◌ 1 دلزده 2 خسته
**cheesemonger** /'tʃi:zmʌŋgə(r)/ *noun*
پەنیرفرۆش ◌ پنیرفروش
**cheese-paring** /'tʃi:z peərɪŋ/ *adjective, noun*
*adj* نــان‌تــاڵ، رژد، گونــک‌بڕێــر، کوورەبەســک، سەقیل، چاوچنۆک، پیــسکە، لەچەر *n* پیــسکەیی، رژدی ◌ *adj* ناخن‌خشک، خسیس *n* خست
**cheese plant** = Swiss cheese plant
**cheesewood** *noun*
دارۆچکــەیێکی هەمیــشەسەوزی گــەرمێنان، بــە گوڵــی ســپی و بــەری نــارنجی مەیلــەو زەرد [*Pittosporum undulatum*] (ئەوســتراڵیا)، *P. viridifolium* (ئــــەفریکــــای باشــــووری) و جۆرەکانی تر] ◌ نوعی درختچه
**cheesy** /'tʃi:zi/ *adjective* (cheesier, cheesiest)
1 پەنیری، پەنیرئاسا 2 بازاڕی، خراپۆکە، ئایەخ: *a cheesy movie* ◌ 1 پنیرمانند 2 بنجل

**cheetah** /'tʃi:tə/ *noun*
هاس، ورشەک، یۆزپڵنگ، چیتا [*Acinonyx jubatus*]، (بنەڕەت: لە *cītā* هیندی، رەنگە لە *citraka*ســانسکریتەوە بێ "leopard") ◌ یوزپلنگ
**chef** /ʃef/ *noun*
سەرئاشپەز، سەرچێشت‌لێن، چێشت‌لێنەر، ئاشپەز ◌ سرآشپز، آشپز
**chef-d'école** /ˌʃɛf deɪ'kɒl, French ʃɛ dekɔl/ *noun*
1 پێشەنگ، سەرجەڵە، رچەشکێن 2 سەرۆکی خوێندنگا ◌ 1 پیش‌تاز 2 رئیس مدرسه
**chef-d'oeuvre** /ˌʃeɪ 'dɜ:vrə, US 'du:vrə/ *noun*
(فەرەنسی) شێی‌دۆڤر، شاکار ◌ شاهکار
**cheiro-** = chiro-
**Chekhovian** /tʃɛ'kəʊvɪən/ *adjective*
چیخۆفی: سەربە بەرهەمەکانی شانۆنامەنووسی رووسی ئانتۆن چێخۆف Anton Chekhov (1860–1904) ◌ چخوفی
**chela**[1] /'ki:lə/ *adjective, pl.* chelae /-li:/
(گیانەوەرناسی) چنگە، پەنجەی چنگ(اڵ)ئاسا یان چرنووکئاسا (وەکوو هی قرژاڵ و هتد؛ بنەڕەت: لە *khēlē* یۆنانی "claw") ◌ کیلا
**chela**[2] /'tʃeɪlə/ *noun*
شاگرد یا مورید یان چراغی گورو guru ◌ چلا
**chelate** /'ki:leɪt/ *adjective, noun*
*adj* 1 (گیانەوەرناسی) چنگەدار، چنگەی هەیە، چنگەهەڵگر 2 (کیمیا) سەربە ئاوێتەیێ کە لەگەڵ دوو باز یان دوو هاوهێزی خۆی دەبەستریتەوە بە ناوەنــدی گــەردیلــەی کانزاکــان و ئاڵــقەیێکی چونیەک پێکدێنێ *n* ناوێتەیێکی کیلیتی ◌ کیلیت
**chelicera** /kə'lɪs(ə)rə/ *noun, pl.* chelicerae /-ri:/
(گیانەوەرناسی) چنگ‌شاخە، شاخ‌چنگە ◌ کلیسرا
**cheliceral** *adjective*
چنــگ‌شــاخەیی، ســەربە یــان پێــوەنــدی بــە شاخ‌چنگەوە هەیە ◌ وابسته به کلیسرا
**Chelicerata** /kəˌlɪsə'reɪtə/ *noun, pl*
چنگ‌شاخەکان، گیانەوەرانی شاخ‌چنگە (بریتین لــە arachnid و sea spider horseshoe (crabs) ◌ کلیسراتا
**chelicerate** /kə'lɪsəreɪt, US -(ə́)rət/ *noun, adjective*
(گیانەوەری) چنگ‌شاخەیی یان شاخ‌چنگە ◌ کلیسرات
**Chellean or Chellian** = Abbevillian
**chelonian** *noun, adjective*
*n* رەقە، کیــەڵ(ی ئاوی)، turtle *adj* سەربە یان پێوەندی بە رەقەوە هەیە ◌ کیلونین
**Chelsea boot** *noun*
جۆرێ چەکمەی پەنجەتیژ ◌ نوعی چکمه

**chem(o, i)-** *prefix*
پێشگر: کیمیا، کیمیایی، لەباری کیمیایی‌یەوە (کارتێ کراو): *chemotaxis*، *chemotherapy* ◌ پیشوند: شیمی، شیمیایی؛ از لحاظ شیمیایی

**chemic** /'kemɪk/ *adjective*
1 کیمیایی 2 (کۆن) - alchemic ◌ شیمیایی

**chemical** /'kemɪkl/ *adjective, noun*
*adj* کیمیایی: *n a chemical element* کەرەسە یان مەتریالی کیمیایی (chemically /-kli/ *adv*: لەباری کیمیایی‌یەوە: *The raw sewage is chemically treated*) ◌ *adj* شیمیایی *n* مادەی شیمیایی

**chemical bomb** *noun*
بۆمبی کیمیایی ◌ بمب شیمیایی

**chemical bond** *noun*
بەند یان پەیوەستی کیمیایی ◌ پیوند شیمیایی

**chemical colouring** *noun*
رەنگاندنی کیمیایی ◌ تلوین شیمیایی

**chemical compound** *noun*
ئاویتەی کیمیایی ◌ ترکیب شیمیایی

**chemical constitution** *noun*
پێکهاتنی کیمیایی ◌ ساخت شیمیایی

**chemical corrosion** *noun*
داخورانی کیمیایی ◌ خوردگی شیمیایی

**chemical diffusion** *noun*
بلاوبوونەوە یا تەشەنەی کیمیایی ◌ انتشار شیمیایی

**chemical engineer** *noun*
ئەندازیار لەبواری کیمیادا، ئەندازیاری کیمیایی ◌ مهندس شیمیایی

**chemical engineering** *noun*
ئەندازیاریی کیمیایی، ئەندازیاریتی کیمیایی ◌ مهندسی شیمیایی

**chemical equation** *noun*
هاوکێشەی کیمیایی ◌ معادلەی شیمیایی

**chemical equilibrium** *noun*
هاوسەنگی یا هاوکێشی کیمیایی ◌ تعادل شیمیایی

**chemical exchange** *noun*
گۆڕینەوەی کیمیایی ◌ تبادل شیمیایی

**chemical formula** *noun*
شێوگی کیمیایی ◌ فرمول شیمیایی

**chemical kinetics** *noun*
جوولەناسی کیمیایی ◌ سنیتیک شیمیایی

**chemical metallurgy** *noun*
کانزاناسی کیمیایی ◌ متالورژی شیمیایی

**chemical physics** *noun*
فیزیکی کیمیایی ◌ فیزیک شیمیایی

**chemical properties** *noun, pl.*
تایبەتمەندی یان رەوشتی کیمیایی ◌ خواص شیمیایی

**chemical research** *noun*
توێژینەوەی کیمیایی ◌ پژوهش شیمیایی

**chemical shift** *noun*
جێگۆڕکێی کیمیایی ◌ جابجایی شیمیایی

**chemical species** *noun, pl.*
جۆرەکانی کیمیایی، جۆرە کیمیایی‌یەکان ◌ گونەهای شیمیایی

**chemical warfare** *noun*
شەڕی کیمیایی ◌ جنگ شیمیایی

**chemiluminescence** *noun*
کیمیارۆشنایی، کیمی‌ڕووناکی: رۆشنایی یا درەوشانەوە (وەک luminescence، bioluminescence) بەهۆی کاردانەوەی کیمیایی (و گەرمایێکی وا بەرچاو بەرهەم ناهێنێ، chemiluminescent *adj*) ◌ کمیلومینسنس

**chemin de fer** /ʃə ˌmæ̃ də 'feə(r), French ʃ(ə)mɛ̃ d(ə) fɛʀ/ *noun*
(فەرەنسی) جۆرێ پەڕین، شێمین دۆ فێر، شەمەن دۆ فێر (واتا: railway) ◌ شمن دو فر

**chemise** /ʃə'mi:z/ *noun*
1 ژێرکراسی ژنانە، ژێرپۆش 2 جۆرێ کراس کە بەسەر شاندا بەردەبووەوە، باوی 20 ـەکان ◌ 1 زیرپیراهن زنانە 2 شمیز

**chemisette** *noun*
کراسی ژنانە، ب.ت. ئەوەی بەرسنگ یان ملی دادەپۆشی و لە سەردەمی ڤیکتۆریا دەپۆشرا، تۆڕی بەرسنگ یان بەرسینە ◌ شمیزت

**chemism** *noun*
کیمیاگەری، شیمیزم ◌ شیمیزم

**chemisorption** /ˌkemɪ'sɔ:pʃ(ə)n, US -'zɔ:p-/ *noun*
مژینی کیمیایی، کیمۆمژە (chemisorbed *adj*) ◌ جذب شیمیایی

**chemist** /'kemɪst/ *noun*
1 کیمیازان 2 دەرمانگەرەوە، دەرمانساز 3 دەرمانخانە، دەرمانساز، دەرمانگەرەوە ◌ 1 شیمی‌دان 2 داروساز 3 داروخانە، داروساز

**chemistry** /'kemɪstri/ *noun, pl.* chemistries
1 کیمیا، زانستی کیمیا، شیمی 2 کار و کاردانەوە 3 پێکهاتە یان رەوشتی کیمیایی ◌ 1 شیمی 2 فعل و انفعال 3 ساختار یا خواص شیمیایی

**chemo-** /'ki:məʊ, US -moʊ/

**chemoautotroph** /ˌki:məʊ'ɔ:tətrəʊf, -trɒf, ˌkem-/ *noun*
کیمیاخۆ(ساز)خۆر: زیندەوەرێ کە وزە لە ئۆکسانی ئاوێتە نائەندامی‌یەکان بەدەس دێنێ (chemoautotrophic /-'trəʊfɪk, -'trɒfɪk/ *adj*، chemoautotrophy /'trəʊfi, -'trɒfi/ *n*) ◌ کیموآوتوتروف

**chemokinesis** *noun*
چالاکی رووڵەبەرەی زیندەوەرێ بەهۆی ماکێکی کیمیایی‌یەوە (chemokinetic *adj*) ◌ کیموکنیز

**chemoprevention** *noun*

کیمیاپێش‌گیری: بەرگیری لە پەرەسەندن یان خاوکردنەوەی شێرپەنجە بە بەکارهێنانی ماکی کیمیایی (chemopreventive *adj*-) ۞ کیموپرونسیون

**chemoprophylaxis** *noun*
کیمیابەرگیری، کیموپێش‌گیری: بەرگیری لە نەخۆشی بەهۆی بەکارهێنانی ماکی کیمیایی ۞ (chemoprophylactic *adj*) کیموپروفیلاکس

**chemoreceptor** /ˈkiːməʊrɪˌseptə, ˌkem-/ *noun*
کیمۆ(وەر)گر، کیمیاوەرگر: هەریەک لە خانە یان ئەندامێکی هەستی‌یەکان کە بۆ بزواندنە کیمیایی‌یەکان بەکاردێتن ( chemoreception *n*) ۞ کیمورسپتور

**chemosensory** *adjective*
کیمیاهەستیار (سەبارەت بە هاندەرە کیمیایی‌یەکان) ۞ کیموسنسوری

**chemosmosis** *noun*
کرداری کیمیایی کە لە پەردەی نیوەدەلێن(ەر)ی خانەکاندا semipermeable membrane روودەدا (chemosmotic *adj*) ۞ کیمواسمز

**chemosphere** *noun*
ناوچەیێکی کەش کە لە stratosphere ـەوە دەس پێ‌دەکا و mesosphere و رەنگە بەشێکی thermosphere بگرێتەوە ۞ کیموسفر

**chemosurgery** *noun*
بەکارهێنانی ماک و مەتریالی کیمیایی بۆ نەهێشتنی شانە نەخۆش یان زیادی‌یەکان (chemosurgical *adj*) ۞ کیموسورجری

**chemosynthesis** /ˌkiːmə(ʊ)ˈsɪnθɪsɪs, US ˌkem-/ *noun*
کیمۆپێکهاتن، کیموسینتیز ( chemosynthetic *adj*: سەربە کیمۆپێکهاتن؛ chemosynthetically *adv*) ۞ کیموستز

**chemotaxis** /ˌkiːmə(ʊ)ˈtaksɪs, ˌkem-/ *noun*
کیمیارێکخەری، رێکخستنی کیمیایی، راکێشانی کیمیایی (chemotactic *adj*: کیمیارێکخەرانە؛ chemotactically *adv*) ۞ شیمی‌آرایی

**chemotaxonomy** *noun*
کیمیاپۆلینەناسی، کیمۆپۆلین‌ناسی: پۆلاندنی رووەک و گیانەوەران بەپێی لێکچوون و جیاوازی‌یەکانی پێکهاتەی زیندەکیمیایی‌یان (chemotaxonomic *adj*؛ chemotaxonomically *adv*؛ chemotaxonomist *n*) ۞ شیمی‌آرایەشناسی

**chemotherapy** /ˌkiːməʊˈθerəpi, US -moʊ-/ *noun*, also -herapeutics
کیمۆت(ێـ)رایی، چارەسەرکردنی نەخۆشی (ب.ت. شێرپەنجە) بە ماکی کیمیایی (chemotherapist chemotherapeutic *adj*؛ *n*) ۞ شیمی‌درمانی

**chemotroph** *noun*
کیمیایی‌خۆر: ئەو زیندەوەرانە کە ئاوێتە ئەندامی و نائەندامی‌یەکان وەک سەرچاوەی سەرەکی وزەکەیان دەئۆکسێتن (chemotrophic *adj*: کیمیایی‌خۆر؛ chemotrophism *n*: کیمیایی‌خۆری) ۞ کموتروف

**chemotropism** *noun*
کیمیاخوازی (chemotropic *adj*؛ chemotropically *adv*) ۞ شیمی‌گرایی

**chemurgy** /ˈkemɜːdʒi/ *noun*
کێمۆرژی، کیمۆرژی: بەکارهێنانی کیمیایی یان پیشەسازی‌یانەی (یا پیشەسازانەی) کەرەسە خاوە ئەندامی‌یەکان ( chemurgic or chemurgical *adj*؛ chemurgically *adv*) ۞ کمورژی

**chenille** /ʃəˈniːl/ *noun*
1 شێنیل (دەزوویێکی نەرم و ئەستوور) 2 پارچەی دەزوویی ۞ شنیل

**cheongsam** / tʃɒŋˈsæm, ˈtʃɔːŋsæm/ *noun*
شانگسام (= کراسێکی تەنگی رێک، بە ملیوانێکی درێژ و بێ‌قۆڵ و دادراوییێ لە هەر دوو لا، کە ژنانی چینی و تایلەندی لەبەری دەکەن)، قەسری بێ‌قۆڵ ۞ شانگسام

**chenopod** /ˈkiːnəpɒd, US ˈken-/ *noun*
(رووەک‌ناسی) قازیاخە، پێ‌قازە، پاقازە، لێشرێ ۞ غاز آیاغی

**cheque** /tʃek/ *noun*, US check
چەک: *to pay by cheque* ۞ چک

**chequebook** /ˈtʃekbʊk/ *noun*
دەستەچەک ۞ دستەچک

**chequebook journalism** *noun*
رۆژنامەنووسیی دەستەچەکی ۞ ژورنالیسم دستەچکی

**cheque card** *noun*
چەک‌کارت، کارتی چەک ۞ چک‌کارت

**chequerboard** *noun*, US checkerboard
تەختەدامە، تەختەشەترەنج ۞ صفحەی شطرنج

**chequered** /ˈtʃekəd, US -kərd/ *adjective*
1 پڕ (لە) هەورازونشێو، پڕکەندولەند 2 خانەخانە، شەترەنجی ۞ 1 پر از موفقیت و عدم موفقیت 2 پیچازی

**the chequered flag** *noun*
ئالای شەترەنجی یا خانەخانەیی ۞ پرچم پیچازی

**chequers** = checkers

**Cherenkov radiation** /tʃəˈreŋkɒf/ *noun*, also Cherenkov radiation also Cherenkov light
(فیزیک) تیشک‌دانەوەی چێرێنکۆف (بنەڕەت: لە ناوی فیزیک‌زانی سۆڤیەت Pavel Cherenkov) ۞ تشعشع چرنکوف

**cherimoya** /ˌtʃerɪˈmɔɪə/ *noun*, also chiridm-
جۆرێ custard apple توێکڵ‌سەوز کە بەری

داریکــی ئانــدی‌یــە [*Annona cherimola*] (بنەڕەت: لە *cherimoya* سپانیایی) ◌ شریمویا

**cherished** *adjective*
خۆشەویست، خۆشدەڤی، ئازیز ◌ ارجمند

**Cherkess** /tʃə'kɛs/ = Circassian

**chernozem** /'tʃə:nəzɛm/ *noun*
گــلەڕەشە (گــڵێکی ڕەشــی مایــەدار، لــە رووسی‌یەوە) ◌ چرنوزم

**Cherokee** /ˌtʃɛrə'ki:/ *noun, pl.* same or Cherokees
1 ئەنــدامی گــەلێکی سووریێــست، جــاران نیشتەجێی زۆربەی باشووری ئەمریکا بوون 2 زمانی Iroquoianای ئەو گەلە ◌ چروکی

**Cherokee rose** *noun*
جۆرێ گوڵەباخی چینی پیاهەڵگەڕاو بە خونچە یان گوڵی سپی بۆنخۆشەوە [*Rosa laevigata*] ◌ رز چروکی

**cheroot** /ʃə'ru:t/ *noun*
شیروت (جـۆرێ جگـەرە کـە هـەر دوو سـەری کراوەیە) ◌ شیروت

**cherry** /'tʃeri/ *noun* (*pl.* cherries), *adjective*
*n* 1 گێلاس، درەخت یا داری گێلاس [ *Prunus avium* (هی کێوی)، *P. cerasus* (هی سوێر) و جۆرەکانی تر] 2 (تافەرمی) بن، کچێنی *adj* سووری ڕۆشن، ئاڵ، گێلاسی ◌ *n* 1 گیلاس، درخت گیلاس، چوب گیلاس 2 بکارت *adj* آلبالویی

**cherry laurel** *noun*
دەوەن یان دارۆچکەیێکی هەمیشەسەوز، بە گوڵی سپی و گەڵای چەرمئاساوە [ *Prunus laurocerasus*] ◌ نوعی بوته یا درختچه

**cherry pie** *noun*
جۆرێ heliotrope باخچەیی، بە گوڵی شینی بۆنخۆشەوە [*Heliotropium arborescens*] ◌ نوعی گیاه

**cherry plum** *noun*
1 دەوەن یان دارۆچکەیێکی باشووری ڕۆژاوای ئاسیا، بە گوڵی سپی و بەرێکی سوور یان زەردی چکۆلەوە [*Prunus cerasifera*] 2 بەر یان میوەی ئەو دارە ◌ 1 نوعی بوته یا درختچه 2 میوەی این بوته

**cherry tomato** *noun*
باینجانی گێلاسی، ب.ت. ڕووەکێکی گەرمێنانی ئـەمریکـا [ *Lycopersicon esculentum cerasiforme*] ◌ چری توماتو

**cherrywood** *noun*
لە داری گێلاس ◌ چوب گیلاس

**cherub** /'tʃerəb/ *noun, pl.* cherubim or cherubs
1 (لە هونەرا) فریشتە 2 [*pl.* cherubs] منداڵی پاک (بە باڵەوە؛ بنەڕەت: لە *cheroub* یۆنانی، لە *kĕrūḇ* عیبری، کۆ *kĕrūḇīm*) ◌ 1 کـروب 2 بچەی معصوم

**cherubic** /tʃə'ru:bɪk/ *adjective*
فریشتەئاسا، فریشتەئاسا (cherubically *adv*: پاکانە) ◌ فرشتەسان

**chervil** /'tʃɜ:vɪl, US 'tʃɜ:rvɪl/ *noun*
جەعفەری فەرەنگی [*Anthriscus cerefolium*] ◌ جعفری فرنگی

**Ches.** = Cheshire

**Chesapeake Bay retriever** *noun*
جۆرێ ڕەگەزی سەگی قەپەی ڕاوی لە میریلەند پەرەی سەندووە و تووکێکی چەوری پڕی هەیە ◌ نوعی سگ

**Cheshire** /'tʃɛʃə/ *noun*
جۆرێ پەنیر ڕەق، لە بنەڕەتا لە Cheshire دەگیرێ ◌ چشیر

**Cheshire cat** *noun*
پشیلەی چێشیر ◌ گربەی چشیر

**chess** /tʃes/ *noun*
شەترەنج، سەرترنجانێ ◌ شطرنج

**chessboard** /'tʃesbɔ:d, US -bɔ:rd/ *noun*
تەختەدامە، تەختەشەترەنج، تەختەسەرترنجانێ ◌ صفحه شطرنج

**chessman** /'tʃesmæn/ *noun*
داشـی شـەترەنج، مـۆرەی شـەترەنج، داری شەترەنج، سوارەی شەترەنج ◌ مهرەی شطرنج

**chest** /tʃest/ *noun*
1 سنووق، یەغدان، سیپ، مەساهـ 2 سنگ، دەفەی سنگ، بەراسووبەن(د؛ -chested *adj*: بنەڕەت: لە *kistē* یۆنانی "box") ◌ 1 صندوق 2 سینه، قفسەی سینه

**chesterfield** /'tʃestəfi:ld, US 'tʃestərf-/ *noun*
1 قەنەپە، میز 2 جۆرێ باڵتە یان باڵاپۆش، زۆرتر بە ملیوانی مەخمەرییەوە و تا سەر چۆکیش دێ ◌ 1 نیمکت 2 نوعی پالتو

**Chester White** *noun*
بەرازەچەرموو: جۆرێ نژادی بەرازی سپی و زلە ◌ نوعی خوک

**chestnut** /'tʃesnʌt/ *noun, adjective*
*n* 1 شابەڕوو، شەمبەلووت، درەختی شابەڕوو، کەستانە، لە داری شابەڕوو، داری شابەڕوو [*Castanea sativa*] 2 ڕەنگی بەڕوویی یان خورمایی 3 ئەسپی کوێت، سوورکوێت، ئەسپی شێ، کەرەندە، ئاڵە 4 قسەی هیچەکە یان بێ‌تام، گاڵتە یان جۆکی کۆن *adj* بەڕوویی، خورمایی، قاوەیی سووریاو ◌ *n* 1 شاه بلوط، درخت شاه بلوط، چوب شاه بلوط 2 رنگ بلوطی 3 اسب کهر 4 جوک قدیمی *adj* خرمایی

**chestnut horse** *noun*
ئەسپی کوێت، ئەسپی شێ، کەرەندە، ئاڵە، ئاڵک ◌ اسب کهر

**chest of drawers** *noun*, US also bureau, dresser
دراویـر، جـێ‌بـەرگی کەشـەوی(دار)، دۆلابی کەشەوی(دار) ۞ دراور

**chest voice** *noun*
نزم‌ترین دەنگ لـە گـۆرانی یـان قـسەکردنا ۞ چـست ویـس

**chesty** /ˈtʃesti/ *adjective* (chestier, chestiest)
1 توشـبوو بـە سـنگ‌ئێـشە 2 مـەمک‌زل، مەمک‌قیت، شەمەند، مەمک‌گەورە 3 فیـزن، بـەپوز، بـەدەمار (**chestily** /ˈtʃestɪli/ *adv*; **chestiness** /ˈtʃestinəs/ *n* ۞ 1 مبتلا بـە سینەدرد 2 درشت‌پستان 3 مغرور

**chetnik** /ˈtʃɛtnɪk/ *noun*, also Chetnik
ئەندامی هێزی گریلای نەتەوەپەروەری سلاڤیک لـە بالـکان، ب.ت. بـەدرێژایی شـەڕی دووەمـی جیهانی ۞ چتنیک

**chetrum** /ˈtʃɛtruːm/ *noun, pl.* same or -ums
یەکـەی پـارەی بوتـان، بەرامبـەر بـە سـەدیەکی ngultrum ۞ چتروم

**cheval-de-frise** *noun, pl.* chevaux-de-frise
بەربەسـتێکی بـەرگری‌یانـەی تێلبەنـد ۞ مـانع دفاعی از سیم خاردار

**cheval glass** /ʃəˈval/ *noun*, also -val mirror
ئاوێنەی بالانوێن، ئاوێنەی درێژ یان قەدی (لەنێو پایەکەیدا دەگەرێ) ۞ آینەی قدی

**chevalier** /ˌʃɛvəˈlɪə/ *noun*
1 (مێژوویی) شیڤالیە، سـوارچاک، شۆرەسـوار 2 ئەندامی هێندێ تیرەی سـوارچاکیتی فـەرەنسـەی نـوێ وەک Legion of Honour 3 ئـەنـدامی نـزم‌تـرین پایـەی خانـەدانـیتی لـە فـەرەنسـە 4 سەربازی سوارە ۞ 1، 2، 3 و 4 شوالیە

**chevelure** *noun*
1 کلاوپرچ، موو یـان قـژی سـەر 2 خـەرمانـەی دەوری چـەقی ئـەسـتێرەی کلـک‌دار یـان دەوری هێندێ لە تەمەکانی ئاسمان ۞ 1 و 2 شوالور

**chevet** /ʃəˈveɪ/ *noun*
(بیناسازی) سەرینە (بنەڕەت: لـە فـەرەنسـی‌یـەوە "pillow") ۞ شیوی

**Cheviot** /ˈtʃɛvɪət, US ˈtʃiːv-/ *noun*
1 جۆرێ مەڕی زلی خوری‌کورت 2 (cheviot) جلی لەخوری ئەو مەڕە (لە *Cheviot*، گردەکانی باکوور ئینگلتەرە و سکاتلەند) ۞ شویت

**chèvre** /ʃɛvr(ə), French ʃɛvʀ/ *noun*
پـەنیری فەرەنسـی لـە شـیری بـزن (بنـەڕەت: لـە فەرەنسـی‌یەوە "بزن") ۞ شور

**chevron** /ˈʃevrən/ *noun*
1 کوچکە، سەرقۆل (نیشانەی V یان Λ لەسەر قـۆل) 2 (لـە بریتانیـا، تەنیـشت ڕێگـا) نیـشانەی مەترسی 3 خشڵێک بە شێوەی V 4 شـارژێکی هێرالدیک بە شێوەی V ئاوەژوو ( charge-med

(*adj* ۞ 1 شوررون 2 علامت خطر 3 و 4 شورون

**chevrotain** /ˈʃɛvrəteɪn/ *noun*
بزنەکێویلە، گیانەوەرێکی ئاسکەئاسای چکۆلانە [توخمەکانی *Tragulus* (ئاسیا) و *Hyemoschus* (ئەفریکا): چوار جۆرن] ۞ آهوی ختا

**chew** /tʃuː/ *noun*
1 جاوین 2 جاچک، شتێ کە بجاوورێ (ب.ت. بەشێ لە توتن) ۞ 1 عمل جویدن 2 چیز جویدنی

**chewing gum** *noun*
1 جۆرێ چەقە 2 بنێشت، جاچکە، وێژەن ۞ 1 یک نوع قندران 2 آدامس

**chewy** /ˈtʃuːi/ *noun*
چـەق، جیـر، چیـر (وەکـو نـان کـە دەبـێ زۆر بجاوورێ) ۞ سفت

**Cheyenne** /ʃʌɪˈan/ *noun, pl.* same or Cheyennes
1 ئەندامی گەلێکی سوورپێست، جاران لە نێوان ڕووبارەکانی Missouri و Arkansas دەژیان 2 زمانی Algonquianی ئەو گەلە ۞ چینی

**chi** /kaɪ/ *noun*
کـای (بیـست و دووەمـین پیتی ئـەلفوبێی یۆنـانی Χ, χ بەرامبەر بە ch یان kh) ۞ کای

**Chianina** /ˌkɪəˈniːnə/ *noun*
(ئیتالیایی) گیانەوەیکی کەتەی سپی لە ڕەگـەزی مانگا، لەبەر گۆشتی بێ‌بەزی رادەگیرێ ۞ کیانیا

**Chianti** /kɪˈanti/ *noun, pl.* Chiantis
جـۆرێ مـەی سـووری ئیتالیـایی (لـە Tuscany دەگیرێ) ۞ کیانتی

**chiaroscure** /kɪˌɑːrəˈskʊərəʊ/ *noun*
تاریـک‌وڕوون(ی)، تکنیکـی ڕوونـاکی‌سـێبەر (وێنەکێشی یان ڕەنگ‌کاری) ۞ سایەروشن

**chiasma** /kʌɪˈazmə, US kɪ-/ *noun, pl.* chiasmata /-tə/
(توێکاری، هـەروەهـا optic chiasma) یەکتربڕ، چەپوڕاستە ۞ تقاطع

**chiasmus** /kʌɪˈazməs, US kɪ-/ *noun*
(هونەری) هەڵگێرانەوە، هەڵگەڕانەوە ( chiastic *adj* ۞ قلب

**chibouk** /tʃɪˈbuːk/ *noun*, also chibouque
سەبیلە (بنەڕەت: لە *çubuk* تورکی‌یەوە بە واتای لوولە) ۞ چپق

**Chibcha** /ˈtʃɪbtʃə/ *noun, pl.* same
1 چیبچـا (ئەندامی گـەلی ڕەسـەنی کولۆمبیـا کـە شارسـتانیەتی کۆنیـان لـە لایـەن ئـەورووپایی‌یەکانـەوە فـەوتا 2 زمـانی چیبچـایی Chibchan تیاچووی ئەو گەلە ۞ چیبچا، شیبشا

**Chibchan** /ˈtʃɪbtʃ(ə)n/ *noun, adjective*
*n* شیبـشان، چیبچـان، شیبـشایی، چیبچـایی (خێزانێکـی زمـانی کولۆمبیـا و ئـەمریکای ناوەنـدی، ئەنـدامانی ئـەم کۆمەڵگایە زۆربـەیان تیاچوون) *adj* سەربە چیبچان ۞ *n* چیبچان *adj*

وابسته به چیچان

**chic** /ʃiːk/ *adjective, noun*

(فەرەنسی) *adj* شیک، جوان، شۆخ *n* شۆخی، شەنگی، شۆخوشەنگی ◌ *adj* شیک *n* شیکی

**Chicana** /tʃɪˈkɑːnjɑː ʃɪ-, -ˈkeɪn-, US tʃɪˈkɑːnjɑ, ʃɪ-/ *noun*

(سپانیایی) چیکانۆ (ژن یان کچی ئەمریکایی بەرەچەڵەک مەکسیکی) ◌ چیکانو

**chicane** /ʃɪˈkeɪn/ *noun*

فروفێڵ، فێڵ، تەڵەکە ◌ حیله

**chicanery** /ʃɪˈkeɪnəri/ *noun, pl.* chicaneries

(فەرمی) تەڵەکەبازی، فێڵەبازی، هەڵفریواندن، فروفێڵ، دەسبڕی، گوێبڕی، لەخشتەبردن ◌ شیادی، فریب‌کاری

**Chicano** /tʃɪˈkɑːnəʊ, ʃɪ-, -ˈkeɪn-, US tʃɪˈkɑːnoʊ, ʃɪ-/ *noun*

(سپانیایی) چیکانۆ (ئەمریکایی بەرەچەڵەک مەکسیکی) ◌ چیکانو

**chicha** /ˈtʃɪtʃə/ *noun*

(لە ئەمریکای ناوەندی و باشووریدا) جۆری ئاوجۆ زۆرتر لە گەنمەشامی ساز دەکرێ ◌ چیچا

**Chichewa** /tʃɪˈtʃeɪwə/ = Nyanja (the language)

**chi-chi** /ˈʃiːʃiː/ *adjective*

بەزریقەوبریقە، بریقەدار، بەئاڵاووالا ◌ غلط‌انداز

**Chichimec** /ˌtʃiːtʃɪˈmek/ *noun, pl.* same or Chichimecs

1 ئەندامی کۆمەڵێ لە گەلانی رەسەن، کە بریتین لە تۆلتێک Toltec و ئازتێک Aztec، جاران زۆرینەی ناوەندی مەکسیکیان پێکدێنا 2 زمانی Uto-Aztecan ئەو گەلانە ◌ چیچیمک

**chick**[1] /tʃɪk/ *noun*

1 جووجەڵە 2 (نافەرمی) منداڵ، کچ، کەنیشک ◌ 1 جوجه 2 بچه، دختر

**chick**[2] /tʃɪk/ *noun*

(نیمچەوشکاری هیند) پەردەی لەوانی (بۆ بەردرگا) ◌ چیک

**chickadee** /ˈtʃɪkədiː, US ˌtʃɪkəˈdiː/ *noun*, also tit

(گیانەوەرناسی) گۆرەوی‌چنە، گۆرەویلە [توخم *Poecile* لە خێزانی Paridae] ◌ چرخ‌ریسک

**chickaree** *noun*

جۆرێ سمۆرەی تووکسوور (هی دارستانە سنەوبەرییەکانی ئەمریکای باکووری [توخم *Tamiasciurus*: سێ جۆرن]) ◌ چیکاری

**Chickasaw** /ˈtʃɪkəsɔː/ *noun, pl.* same or Chickasaws

1 ئەندامی گەلێکی سووورپێست، جاران دانیشتووی Mississippi و Alabama بوون 2 زمانی Muskogian ی ئەو گەلە ◌ چیکاسو

**chicken** /ˈtʃɪkɪn/ *noun*

1 مریشک، جووجە، زڤان، جووجک، بارۆکە 2 کەڵەشێر، کەڵەباب 3 گۆشتی بارۆکە یا مریشک یان کەڵەشێر 4 ترسەنۆک، حیز، بێ‌غیرەت 5 (نافەرمی) جۆرێ کایە 6 (زمانی رەمەکی) نێری هاورەگەزبازی لاو، کوڕی هاورەگەزباز ◌ 1 جوجه 2 خروس 3 گوشت جوجه یا مرغ، گوشت ماکیان 4 بزدل 5 نوعی بازی 6 پسر هم‌جنس‌باز

**chicken à la king** *noun*

سنگی لێنراوی مریشک لەنێو سۆسی کرێمدا لەگەڵ قارچک و بیبار (دەڵێن لە ناوی E. Clark *King*، خاوەن هوتێلی نیویۆرک هەڵگیراوەتەوە) ◌ چیکن آ لاکینگ

**chicken-breast** /ˈtʃɪkɪn brest/ *noun*

سنگ‌دەرپەڕیوی، سنگی کووڕ، سنگی کۆتری ◌ سینه‌ی کفتری

**chicken-breasted** *adjective*

سنگ‌دەرپەڕیو، سنگ‌کووڕ، سنگ‌کۆتری ◌ سینه‌کفتری

**chicken colonel** *noun*, also bird colonel

(زمانی رەمەکی) کۆلۆنێل (ی تەواو) تا لە lieutenant colonel هەڵبوێردرێ (ئاماژە بە هەڵۆێ لەسەر شانی کۆلۆنێل) ◌ چیکن کلنل

**chickenfeed** *noun*

1 پڕپۆڵە، خۆراکی مریشک و کەڵەشێر 2 شایی، پەنابات، پارەی کەم ◌ 1 خوراک طیور 2 پول ناچیز

**chickenhearted** *adjective*

ترسەنۆک، نەوێر، حیز، نەوێرەک ◌ ترسو

**chickenpox** /ˈtʃɪkɪnpɒks, US -pɑːks/ *noun*

مێکوتە، دڕیلە، دانکە، دڕکە، خڕۆکەی مریشک، ئاوڵەی مەل، varicella ◌ آبله‌مرغان

**chicken-run** *noun*

پەرژین (لە دار) بۆ مریشک و کەڵەشێر، پەرژینی مریشکان ◌ چیکن‌ران

**chickenshit** /ˈtʃɪkɪnʃɪt/ *noun, adjective*

*n* 1 کەسێکی ترسەنۆک، حیز 2 شڕەوبڕ، هەڵیت‌وپڵیت *adj* ترسەنۆک، حیز، دەڵەچە، خوێڕی، نەوێرەک، cowardly ◌ *n* 1 آدم ترسو 2 شر و ور *adj* ترسو، پست

**chicken snake** = rat snake

**chicken wire** *noun*

تێل یان وایەری تۆڕی ◌ توری مرغی

**chickling vetch** *noun*

(رووەکناسی) دەرزیلە [*Lathyrus sativus*] ◌ خلر

**chickpea** /ˈtʃɪk piː/ *noun*

1 نۆک [*Cicer arietinum*] 2 دەنکی نۆک ◌ 1 نخود 2 دانه‌ی نخود

**chickweed** /ˈtʃɪkwiːd/ *noun*

(رووەکناسی) گیامەل، گیانۆکی (بۆ خواردنی باڵندەکان [*Stellaria media*] و گەلێ جۆری

پێوەندیدار] ◌ علف پرنده

**chicle** /'tʃɪkl, US 'tʃɪkli/ *noun*
1 سەمغی بنێشت 2 وشەیێکی تر بۆ sapodilla ◌ چیکل

**chicory** /'tʃɪkəri/ *noun, pl.* chicories
1 (رووەکناسی، لە ئەمریکا) چەقچەقە، هندوبا، کاسنی، 2 [*Cichorium endivia*] endive رەگ و بنجی چەقچەقە (endive) ◌ 1 کاسنی، کاسنی فرنگی 2 ریشەی کاسنی

**chid** = past and past participle of chide

**chidden** = past participle of chide

**chief** /tʃi:f/ *noun, adjective*
*n* 1 سەرۆک، سەرەک، پایەبەرزترین، گەورە، سەر، کەلان، میر: *army/industry/police chiefs* 2 سەرۆکی هۆز، کەلانتەر، سەرخێل، سەرهۆز، سەرتیرە 3 ریسەر، فەرماندەر، فەرماندار، سالار، سەردار، سەرکردە 4 بەڕێز، کاکە (لە بانگکردندا)، گشتی، سەر (لە لێکداندا): *commander-in-chief* *adj* گرنگ، گرنگترین، سەرەکی، بنەرەتی، بنچینەیی، بنکەیی: *the chief cause/problem/reason* (chiefdom *n*) ◌ *n* 1 رئیس 2 رئیس قبیله 3 فرمانده، سالار 4 آقا (در خطاب)، ـکل، سر ـ *adj* مهم، اساسی، عمده، مهم‌ترین

**chief constable** *noun*
سەرۆکی پۆلیس (خۆجێیی) ◌ رئیس کلانتری

**chief editor** *noun*
سەرنووسەر ◌ سردبیر

**chief executive** *noun*
گەورە، سەرۆک (کۆمپانی یان ڕێکخراوەیێ) ◌ رئیس

**Chief Executive** *noun*
سەرۆککۆمار یا سەرکۆماری ئەمریکا ◌ رئیس جمهور امریکا

**chief executive officer** *noun*
فەرمانبەری پایەبەرز (کەسێ (لە کۆمپانییێ) کە دەسڕۆیشتوو و بەهێزترینە) ◌ مأمور عالی‌رتبه

**chief inspector** *noun*
سەرپشکێنەر ◌ سربازرس

**chief justice** *noun*
1 سەرۆکی دادگای بالا 2 سەردادگا، سەرۆکی دادگا ◌ 1 رئیس دیوان عالی کشور 2 رئیس دادگاه

**chiefly** /'tʃi:fli/ *adverb*
بەتایبەت، لەپێشەوە، بە پلەی یەکەم ◌ مخصوصاً، در درجه‌ی اول

**chief master sergeant** *noun*
پایەیێکی دوائەفسەری هێزی ئاسمانی ئەمریکا، لەژوور senior master sergeant و لەخوار chief warrant officer ◌ استوار نیروی هوایی

**chief of staff** *noun*
سەرۆک یان بەرپرسی بارەگا، سەربارەگا ◌ رئیس ستاد

**chief of state** *noun*
سەرۆکی میری یان حکومەت ◌ رئیس دولت

**chief petty officer** *noun*
پایە یان پلەیێکی دوائەفسەری هێزی دەریایی، لەژوور petty officer و لەخوار warrant officer یا senior chief petty officer ◌ ناوبان دوم

**chief superintendent** *noun*
سەرچاودێر، چاودێری سەرەکی ◌ سرناظر

**chieftain** /'tʃi:ftən/ *noun*
سەرۆکی هێز، سەرهۆز، سەرخێل، سەرعێل ◌ رئیس قبیله

**chieftaincy** /-si/ *noun, pl.* chieftaincies
سەرۆکایەتی هۆز یان خێل، سەرخێلی ◌ ریاست قبیله

**chieftainship** /'tʃi:ftənʃɪp/ *noun*
سەرۆکایەتی هۆز یان خێل، سەرخێلی، سەرعێلی ◌ ریاست قبیله

**chief technician** *noun*
پایە یان پلەیێکی دوائەفسەری RAF، لەژوور sergeant و لەژێر flight sergeant ◌ چیف تکنیسین

**chief warrant officer** *noun*
پایە یان پلەیێکی هێزە چەکدارەکانی ئەمریکا، لەژوور warrant officer و لەژێر پایەنزمترین ئەفسەری هەمیشەیی یان کادر commissioned officer ◌ استوار یکم

**chiffon** /'ʃɪfɒn, US ʃɪ'fɑ:n/ *noun, adjective*
*n* 1 شیفان، شیفۆن (جۆرێ پارچەی نەرم و تەنک، لە بەشم، نایلۆن یان ڕیۆن دروست دەکرێ) 2 بەنۆکە، زنجیرە lace و هتد جوانی کە کراس و جلی ژنان *adj* دروستکراو لە پارچە یان کوتالی شیفۆن ◌ شیفون

**chiffonier** /ˌʃɪfə'nɪə/ *noun*
1 دۆلابی نزم 2 جۆرێ دۆلابی بەرزی دراوێری ◌ 1 شیفونیر 2 قفسەی کوچک کشودار

**chigger** /'tʃɪgə, US 'dʒ-/ *noun,* also jigger /'dʒɪgə(r)/
1 جۆرێ کێچ [*Tunga penetrans*] 2 مۆرانەی دەغل ◌ چیگر

**chignon** /'ʃi:njɒn, US -jɑ:n/ *noun*
(فەرەنسی) قوتکە (قوتەوەکردوو (قژ و لەپشتسەر) ◌ شینیون

**chigoe** /'tʃɪgəʊ/ *noun*
جۆرێ کێچ، وشەیێکی تر بۆ chigger 1 ◌ نوعی کک

**Chihuahua** /tʃɪ'wɑ:wə, US -'wɑ:wɑ:/ *noun,* also chihuahua
چیواوا (جۆرێ سەگی چکۆلانەی گوێزل و تووکنەرم) ◌ چیواوا

**chikungunya** /ˌtʃɪk(ə)nˈɡʌnjə/ *noun*
نەخۆشییەکی ڤایرۆسی شێوەی dengue دەدا، mosquitoe ـەکان رایدەگوێزن و نەخۆشییەکی ناوچەییە لە رۆژهەلاتی ئەفریکا و چەند بەشێکی ئاسیا ۞ چیکونگونیا

**chilblain** /ˈtʃɪlbleɪn/ *noun*
سەرمابردن، سەرمابردوویی، نەکسو ۞ سرمازدگی، سرماخوردگی

**chilblained** *adjective*
سەرمابردوو ۞ دچار سرماخوردگی

**child** /tʃaɪld/ *noun, pl.* children
1 منال، مندال، زارۆک، بەچ، بەچە، وەچ، کۆرپە، ساوا، رۆلە، فرزەند 2 ئاوەلمە، کۆرپەلە، تۆل، پێزە 3 (خوازە) ئەنجام، زادە، ئاکام 4 مرۆ یان کەسێکی بێئەزموون یان خاو 5 مرید، بەردەست childless /ˈtʃaɪldləs/ *adj*): بێمنال، وەجاخکوێر، بێفرزەند؛ childlessness *n*: ئەلمانی بنەرەت) ۞ 1 بچە، کودک، فرزند 2 جنین، رویان 3 (مجازی) نتیجە 4 آدم بیتجربە 5 مرید

**child abuse** *noun*
تاوانی زیان بە منال گەیاندن (ج سێکسی، جەستەیی یا سۆزی)، مندالئازاری ۞ جنایت آسیبرسانی بە بچە

**childbearing** /ˈtʃaɪldbeərɪŋ, US -ber-/ *noun, adjective*
*n* منالبوون *adj* سەربە منالبوون ۞ *n* زایمان *adj* وابستە بە بچەدار شدن

**childbed** = archaic term for childbirth

**childbed fever** = puerperal fever

**child benefit** *noun*
مووچەی منال(ان) یان فرزەندان ۞ حق اولاد

**childbirth** /ˈtʃaɪldbɜːθ, US -bɜːrθ/ *noun*
منالبوون، پەیدابوون، بوون، لێبوونەوە ۞ زایمان

**childcare** /ˈtʃaɪldkeə(r), US -ker/ *noun*
ئاگاداریکردنی منال (ب.ت. کەسێ کە دایکوباوکی کار دەکەن) ۞ مراقبت از بچە

**Childemass** /ˈtʃɪldəmas/ *noun*
جەژنێکە لە 28ی دیسامبرا دەکرێ ۞ چایلدمس

**childhood** /ˈtʃaɪldhʊd/ *noun*
منالی، سەردەمی مندالی، سەرودەمی منالی ۞ بچگی، دوران بچگی

**childish** /ˈtʃaɪldɪʃ/ *adjective*
1 منالانە: 2 *childish handwriting* بێئەزموون، خاو، ناپوخت ( childishly /ˈtʃaɪldɪʃli/ *adv*: منالانە: *to behave childishly*: 1 childishness /ˈtʃaɪldɪʃnəs/ *n* منالێتی 2 بێئەزموونی، خاوی) ۞ 1 بچگانە 2 بیتجربە

**childlike** /ˈtʃaɪldlaɪk/ *adjective*
منالئاسا، پاک، بێفێل و سادە ( childlikeness *n*) ۞ معصوم، کودکمانند

**childminder** /ˈtʃaɪldmaɪndə(r)/ *noun*
منالیار، لەلەی منال، کەسێ کە ئاگای لە منالانە ۞ پرستار بچە

**child prodigy** *noun*
منالی هەلکەوتە یان بلیمەت ۞ کودک نابغە

**childproof** /ˈtʃaɪldpruːf/ *adjective*
بێمەترسی بۆ منالان، منالپارێز ۞ کودکایمن

**children** = plural form of child

**children's home** *noun*
خانەی منالان یان مندالان ۞ پرورشگاه

**child restraint** *noun*
منالپارێز (کەمەر یان کورسییەکی کەمەربەندی لە ماشێندا بۆ راگرتن یان دانیشتنی منال) ۞ دارای کمربند ایمنی برای بچەها

**child seat** = car seat

**child's play** *noun*
کاری ئاسان، وەکوو ئاوخواردنەوە ۞ کار سادە

**Chilean** /ˈtʃɪliən/ *noun, adjective*
*n* خەلکی شیلی Chile /ˈtʃɪli/، چیلیایی، شیلیایی *adj* سەربە شیلی یان چیلی، شیلیایی ۞ *n* اهل شیلی *adj* وابستە بە شیلی

**Chile pine** = monkey puzzle

**chili** /ˈtʃɪli/ *pl.* chilies: US spelling of chilli

**chiliarch** /ˈkɪlɪɑːk/ *noun*
1 (مێژوویی، لە یۆنانی کۆندا) سەرهەزارە، فەرماندەری هەزار پیاو 2 هەزار دانە یان دەنک 3 هەزار سال، هەزارسالە، هەزارە (بنەرەت: لە *khilioi* یۆنانی "هەزار") ۞ 1 فرماندەی هزار مرد 2 هزار عدد 3 هزار سال

**chiliasm** *noun*
باوەڕ بە هاتنەوەی هەزارسالەی کریست. (chiliastic *adj*) millenarianism ۞ کیالیزم

**chiliast** /ˈkɪlɪast/ = millenarian

**chill** /tʃɪl/ *noun, adjective*
*n* تەز، تەزوو، تەشق، سەقەم، سەرما(وسۆلە)، لەرز، لەرزوتا، چەقوچۆ، مووچرک، ترسولەرز، سەرمابوون، بابەڕی، چایمان *adj* 1 سارد، نادلسۆز، سڕ 2 ترسێنەر (chilled *adj*: ساردەوەکراو، سارد؛ ئەلمانی بنەرەت) ۞ *n* سوز، سرما، لرزە، بیم، تبولرز، سرماخوردگی *adj* 1 نامهربان 2 ترسناک

**chiller** *noun*
چیرۆکی مووچرکاوی یا مووچرکپیاهێن یا ترسێنەر ۞ داستان دلهرەآور

**chilli** /ˈtʃɪli/ *noun*, also chilli pepper, chile, US chili
بیبارەسوورە ۞ چیلی

**chilli con carne** /ˌtʃɪli kɒn ˈkɑːni, US kɑːn ˈkɑːrni/ *noun*
چێشتێکی گەرم و تیژی مەکسیکی ۞ چیلی

**chilling** /ˈtʃɪlɪŋ/ *adjective*

**chromatic** /krə'mætɪk/ *adjective*
1 ڕەنگی، ڕەنگین 2 کرۆماتیک، نیوپەردەیی (هەبوونی کۆمەڵە نۆتێ لە پەیژەی کرۆماتیکدا chromatic scale، سەربە یان پەیژەی کرۆماتیکی موسیقایی دەگرێتەوە، زنجیرەیێ لەو نۆتە موسیقایانە کە لە semitone دا هەڵس و کەوتیان (یان بەرز و نزمییان) هەیە؛ نیوپەردە نیوپەردە دەچنەسەرێ یان دێتەخوارێ؛ chromatically *adv*) ◌ 1 رنگی 2 کروماتیک، نیم‌پرده‌ای

**chromatic aberration** *noun*
لادان یان هەڵەی ڕەنگین: لادانێ کە لە ئەنجامی جیاوازییەکانی شکانەوەی تیشکە ڕەنگینەکانی شەبەنگ پێکدێ ◌ ناهنجاری کروماتیدی

**chromaticism** *noun*
شێوازی موسیقایی کرۆماتیک ◌ کروماتیسیسم

**chromaticity** /ˌkrəʊmə'tɪsɪti/ *noun*
چۆنێتی ڕەنگ (جیا لە گەشێتی) ◌ کیفیت رنگ

**chromatics** *noun, pl.*
ڕەنگناسی، زانستی ڕەنگ ◌ رنگ‌شناسی

**chromatic scale** *noun*
(موسیقا) پەیژەی کرۆماتیک: پەیژەیێکی موسیقایی کە تەواو لە (کۆمەڵە) نیوپەردە half step پێکهاتووە ◌ گام کروماتیک

**chromatid** /'krəʊmətɪd/ *noun*
(زیندەناسی) کرۆماتید، ڕەنگید: هەریەک لەو جووتە ریشاڵ یان هەودای هاوتەریبی کرۆمۆزۆمی کە بە centromere یەکەوە پێکەوە بەستراونەتەوە (لەواندا کرۆمۆزۆمێ بە درێژایی دابەشبوونی خانەیی دابەش دەبێتەوە، ڕەنگ + - id[2]) ◌ کروماتید

**chromatin** /'krəʊmətɪn/ *noun*
(زیندەناسی) کرۆماتین، ڕەنگینە: ماکێ کە کرۆمۆزۆمە نابەکتریاییەکان لەو پێکدێ و لە پرۆتێین، RNA و DNA پێکهاتووە ◌ کروماتین

**chromatinic** *adjective*
سەربە یا پێوەندی بە کرۆماتینەوە هەیە، ڕەنگینەیی ◌ وابسته به کروماتین

**chromatism** *noun*
جۆرێ ڕەنگاندنی نائاسایی گەڵاکان یان زۆرتر بەشە سەوزەکانی تری ڕووەک یان گیایێ ◌ کروماتیسم

**chromatogram** *noun*
کرۆماتۆگرام ◌ کروماتوگرام، رنگ‌نگاره

**chromatographic** /krəʊˌmætə'græfɪk, US ˌkroʊ-/ *adjective*
سەربە کرۆماتۆگرافی یان ڕەنگۆگرافی ◌ وابسته به کروماتوگرافی

**chromatographic analysis** *noun*
شیکردنەوەی کرۆماتۆگرافی ◌ تحلیل کروماتوگرافی

**chromatographic column** *noun*
ستوونی کرۆماتۆگرافی ◌ ستون کروماتوگرافی

**chromatography** /ˌkrəʊmə'tɒgrəfi, US ˌkroʊmə'tɑːg-/ *noun*
کرۆماتۆگرافی، ڕەنگۆگرافی ◌ کروماتوگرافی

**chromatolysis** *noun*
شیکردنەوەی مەتریاڵە ڕەنگییەکانی خانە ◌ کروماتولیز، کروماتولیسیس

**chromatolytic** *adjective*
سەربە chromatolysis ◌ وابسته به کروماتولیز

**chromatometer** *noun*, also chromometer
ڕەنگپێو ◌ رنگ‌سنج

**chromatophil** = chromophil

**chromatophore** *noun*
ڕەنگ‌هەڵگر: 1 خانەیێ کە ڕەنگی تیایە، ب.ت. ئەوەی کە بۆ تاوێ ڕەنگ بەرهەم دێنێ، وەک لە cuttlefishe ـەکان(دا) 2 یەکێ لە دارشتە ڕەنگینەکانی نێو خانەکانی ڕووەک ◌ کروماتوفور

**chromatophoric** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە ڕەنگ‌هەڵگرەوە هەیە ◌ وابسته به کروماتوفور

**chromatophorous** *adjective*
خاوەن ڕەنگ‌هەڵگر، ڕەنگ‌هەڵگردار ◌ دارای کروماتوفور

**chrome** /krəʊm, US kroʊm/ *noun, adjective*
1 *n* توخمی کرۆم، ڕەنگە، کرۆمیۆم: *glittering modern buildings of chrome, steel and glass* 2 دارشتەی کرۆم *adj* کرۆمی، کرۆمکرد، دروس‌کراو لە کرۆم، لە کرۆم ◌ *n* 1 عنصر کروم 2 آلیاژ کروم *adj* کرومی

**chrome green** *noun*
سەوزی کرۆم(ی): هەموو جۆرە ڕەنگە سەوزە گەشەکان کە تێیان دایە یان پێکهاتوون لە ئاوێتە کرۆمیۆمەکان ◌ گرین کروم

**chrome leather** *noun*
چەرمی کرۆم (= بە خوێی کرمۆمیۆم خۆش کراوە) ◌ چرم کروم

**chrome steel** *noun*
پۆڵای کرۆم ◌ فولاد کروم

**chrome yellow** *noun*
زەردی کرۆم(ی): ڕەنگێکی زەرد کە لە بنەڕەتا لە lead chromate سروشتی $PbCrO_4$ پێکهاتووە ◌ یلو کروم

**chromic** *adjective*
کرۆمی، ڕەنگەیی، سەربە کرۆم ◌ وابسته به کروم

**chromic acid** *noun*
ترشەڵۆکی کرۆم $H_2CrO_4$ ◌ اسید کروم

**chromide** *noun*
ماسییێکی چکۆلەی سەوز یا نارنجی هیند و سریلانکا [توخم *Etroplus*: دوو جۆرن] ◌

نوعی ماهی

**chrominance** *noun*
جیاوازی نیوان ڕەنگێ و ڕەنگێکی سەرچاوە (ی هەڵبژاردە) کە ڕووناکی‌یێکی بەرامبەریان لە تەلەفزیۆنی ڕەنگی‌دا هەیە ۞ کرومینانس

**chromite** /'krəʊmʌɪt/ *noun*
کرۆمایت، کانی خاوی سەرەکی کرۆمیۆم ۞ کرومیت

**chromium** /'krəʊmiəm, US 'kroʊ-/ *noun*
کرۆم، کرۆمیۆم (بە ز.گ. 24، ن. Cr؛ بنەڕەت: chrome + -ium) ۞ کروم

**chromo-** = chrom

**chromocentre** *noun*
ڕەنگناوەند، ناوەندی ڕەنگ: کۆبوونەوەی ڕەنگێکی چڕ لە ناوچە heterochromatic ـەکانی هێندێ ناوکی خانەدا ۞ کروموستر

**chromocyte** *noun*, also pigment cell
خانەی ڕەنگی یان ڕەنگین، خانە یان ژوورەی پیگمێنت ۞ سلول رنگی

**chromogen** *noun*
(مەتریالی) 1 ڕەنگ‌پێکهێن، ڕەنگ‌ساز، دەنکە ڕەنگی‌یەکانی ڕووەک 2 بەکتریای ڕەنگ‌پێکهێن یان ڕەنگ‌ساز ۞ 1 رنگ‌زا 2 باکتری رنگ‌زا

**chromogenesis** *noun*
ڕەنگ‌پێکهاتن، پێکهاتنی ڕەنگ، ڕەنگ‌سازی ۞ رنگ‌زایی

**chromogenic** *adjective*
ڕەنگ‌پێکهێن، ڕەنگ‌ساز ۞ رنگ‌زا

**chromolithograph** *noun*
وێنەیێکی ڕەنگی چاپ‌کراو بە لیتۆگرافی ۞ کرومولیتوگراف

**chromolithographic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە کرۆمۆلیتۆگرافی‌یەوە هەیە ۞ وابسته به کرومولیتوگرافی

**chromolithography** *noun*
بەرهەم‌هێنانی وێنەی ڕەنگی بە ڕێی لیتۆگرافی‌یەوە ۞ کرومولیتوگرافی

**chromoly** /'krəʊmɒli/ *noun*
پۆڵایێ کە chromium و molybdenum ی تیایە، بۆ سازکردنی شتی سووک و ڕەختە وەک چوارچێوەی دووچەرخە بەکاردێنرێ (تێکەڵەی chromium و molybdenum ـە) ۞ کرومولی

**chromomere** *noun*
ڕەنگ‌پارزە، ڕەنگین‌پارزە، پارزەڕەنگینە، کرۆمۆمێر (chromomeric *adj*: سەربە یان پێوەندی بە ڕەنگ‌پارزە یا کرۆمۆمێرەوە هەیە) ۞ کرومومر

**chromometer** /krəʊməʊmi:tə(r)/ *noun*
ڕەنگ‌پێو ۞ رنگ‌سنج

**chromophil** *noun*
ڕەنگ‌دۆست، ڕەنگ‌گر، ڕەنگ‌خواز ۞ رنگ‌دوست

**chromophilous** *adjective*
ڕەنگ‌دۆست، ڕەنگ‌گر، ڕەنگ‌خواز ۞ رنگ‌دوست

**chromophobe** *adjective*, also -romophobic
ڕەنگ‌نەویست، ڕەنگ‌ترس، ڕەنگ‌نەگر، ڕەنگ‌پەڕین ۞ کروموفوب

**chromophore** *noun*
کۆمەڵی ڕەنگی گەرد یان مۆلۆکۆل، کۆمەڵێکی کیمیایی کە ڕەنگی ئاوێتەیێ بەرهەم دێنێ، وەک کۆمەڵی azo [-N=N-] ۞ کروموفور

**chromophoric** *adjective*
سەربە کرۆمۆفۆر ۞ وابسته به کروموفور

**chromoplasm** *noun*
کلۆرۆپلازم ۞ کروموپلاسم

**chromoplast** /'krəʊməplast, -plɑ:st/ *noun*
(ڕووەک‌ناسی) ڕەنگەدارشت(ـە): جۆرێ دارشتەی plastid ڕەنگی کە پتر ڕەنگ pigment ی زەرد یا سووری تیایە (وەک carotene) ۞ کروموپلاست

**chromoprotein** *noun*
کرۆمۆپرۆتئین: هەریەک لە پرۆتئینە جۆراوجۆرەکان (وەک hemoglobin، carotenoid یان flavoprotein) کە وەک کۆمەڵێکی prosthetic خاوەنی ڕەنگ یان پیگمێنتێکن، پرۆتئینێ، وەک hemoglobin یان rhodopsin کە کۆمەڵێکی ناپرۆتئینی ڕەنگی‌یان تێدایە (وەک haem، riboflavin یان retinal) ۞ کروموپروتئین

**chromosomal** /ˌkrəʊmə'səʊməl, US ˌkroʊmə'soʊməl/ *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە کرۆمۆزۆمەوە هەیە، ڕەنگ(ین)تەنی ۞ وابسته به کروموزم

**chromosome** /'krəʊməsəʊm, US 'kroʊməsoʊm/ *noun*
کرۆمۆزۆم، ڕەنگ‌تەن، ڕەنگین‌تەن، تەنەڕەنگینە ۞ کروموزوم

**chromosphere** *noun*
کرۆمۆسفێر، کرۆمۆگۆ، ڕەنگینەگۆ، چینەڕەنگینە: توێیێکی گازی مەیلەوسوور یان سوورباو، دەس‌بەجێ لە ژوور چینەڕۆشنە photosphere خۆر یان ئەستێرەیێکی تر (و تاجەکەی) ۞ رنگین‌کره

**chromospheric** *adjective*
کرۆمۆسفێری، چینەڕەنگینەیی، سەربە کرۆمۆسفێر ۞ وابسته به رنگین‌کره

**chromous** *adjective*
chromium دووهاوهێز(ە)ی تیایە ۞ دارای کروم دوظرفیتی

**chromyl** *adjective*

chromium شەش‌هاوهێز(ە)ی تیایە ◌ دارای کروم شش‌ظرفیتی

**chron(o)-** *prefix*
پێشگر: دەم، کات، سەردەم، زەمان، سەربە کات یان زەمان: *chronometry* ،*chronogram* (بنەڕەت: لە *khronos* یۆنانی "time") ◌ پیشوند: گاه، زمان

**chron** *abbreviation* 1 chronicle 2 chronological 3 chronology

**Chron** *abbreviation* Chronicles

**chronic** /'krɒnɪk, US 'krɑ:n-/ *adjective*
1 درێژخایەن، زۆرپێچوو، ماوەبەر: *chronic* *indigestion* 2 (نافەرمی) توند، سەخت، گران، خراپ، شپرزە: *The film was just chronic* ◌ 1 مزمن 2 وخیم، حاد، افتضاح

**chronically** /'krɒnɪkli, US 'krɑ:n-/ *adverb*
درێژخایەنانە، بەشێوەیەکی درێژخایەن: *a hospital for the -onically ill* ◌ به طور مزمن

**chronic fatigue syndrome** *noun, abbreviation* CFS
ڕەوشێکی پزشکی کە هۆیەکەی ڕوون نییە و تای لەگەڵە و ماندوویی و دڵتەنگی‌یێکی درێژخایەن و بەئێشی پێوەیە ◌ سندروم فاتیگ کرونیک

**chronic obstructive pulmonary disease** *noun, abbreviation* COPD
جۆرێ نەخۆشی سی‌یەکان، تەنگ‌بوونەوەی airways و کێشە لە هەناسە کێشاندا (وەک emphysema و chronic bronchitis) ◌ سی‌اوپی‌دی

**chronicity** /'krə'nɪsəti/ *noun*
درێژخایەنی، زۆرپێچوویی ◌ مزمنی

**chronicle** /'krɒnɪkl, US 'krɑ:n-/ *noun*
تۆماری ڕووداوە مێژوویی‌یەکان، ڕووداونامە ◌ گاه‌شمار وقایع

**chronicler** /'krɒnɪklə(r), US 'krɑ:n-/ *noun*
ڕووداونامەنووس ◌ ثبت‌کنندەی گاه‌شمار وقایع

**Chronicles** *noun, pl.*, also Paralipomenon
هەریەک لەو دوو کتێبی مێژوویی پەیمانی کۆن ◌ کرونیکلز

**chronobiologic** *noun*, also chronobiological
سەربە کات‌زیندەناسی یا زیندەناسی زەمانی، پێوەندی بە کات‌زیندەناسی‌یەوە هەیە ◌ وابسته به زمان‌زیست‌شناسی

**chronobiologist** *noun*
کات‌زیندەناس، زیندەناسی زەمانی ◌ زمان‌زیست‌شناس

**chronobiology** *noun*
کات‌زیندەناسی، زیندەناسی زەمانی، کرۆنۆبایۆلۆژی: لقێ لە زیندەناسی کە لەمەڕ دیاردە کارئەندامناسی‌یە سووڕی‌یەکان دەکۆڵێتەوە، زانست یان لێکۆڵینەوەی کاریگەری کات یان زەمان، ب.ت. بەسەر ڕەوتی کار و کاردانەوەی سیستمە زیندووەکان، لێکۆڵینەوەی ڕیتمە زیندەناسی‌یەکان ◌ زمان‌زیست‌شناسی، کرونوبیولوژی

**chronogram** *noun*
کات‌دەربڕ: نووسراوە، ڕستە یان بڕگەیێ کە لەودا هێندێ لە پیتەکان ڕێکەوت یان قۆناخێ دەردەبڕن ◌ کرونوگرام

**chronogrammatic** *adjective*, also chronogrammatical
سەربە کات‌دەربڕ ◌ وابسته به کرونوگرام

**chronograph** /'krɒnəgrɑ:f, US 'krɑ:nəgræf/ *noun*
کرۆنۆگراف، کات‌پێو، کاتنووس ◌ زمان‌نگار

**chronologer** = chronologist

**chronologist** *noun*
کرۆنۆلۆژیست، ڕێکخەری ڕووداوەکان ◌ کرونولوژیست

**chronological** /,krɒnə'lɒdʒɪkl, US ,krɑ:nə'lɑ:dʒ-/ *adjective*, also chronologic
کاتی، ڕێکخراو، بەڕیز (ڕووداوەکان)، بەڕیزڕێکخراو، بەڕیزدانراو، زنجیرەمەند لەباری مێژوویی‌یەوە، بەپێی ڕیزبەندی کات و زەمان: *chronological tables of American history* ◌ زمانی، دارای ربط زمانی

**chronological age** *noun*
تەمەنی ڕاستەقینە ◌ سن زمانی

**chronologically** /-kli/ *adverb*
بەڕیز ڕێکخرانەوە ◌ از نظر زمانی

**chronology** /krə'nɒlədʒi, US -'nɑ:l-/ *noun, pl.* chronologies
ڕێکخستنی ڕووداوەکان، بەڕیزدانان (ڕووداوەکان)، ڕووداوناسی، بەڕیکەوت‌دانان، مێژووناسی ◌ ترتیب زمانی، گاه‌شماری وقایع

**chronometer** /krə'nɒmɪtə(r), US -'nɑ:m-/ *noun*
کات‌پێو ◌ زمان‌سنج

**chronometrical** *adjective*, also -onometric
سەربە کات‌پێوی، کات‌پێوی‌یانە ◌ وابسته به زمان‌سنجی

**chronometry** /krəʊ'nɑmətri/ *noun*
کات‌پێوی ◌ زمان‌سنجی

**chrysalid** /'krɪs(ə)lɪd/ *noun, adjective*
*n* پیلە ◌ *adj* سەربە قۆزاخە chrysalis = *n* وابسته به پیله *adj*

**chrysalis** /'krɪsəlɪs/ *noun, pl.* chrysalises
قۆزاخە، سازیرە، زیرینە، کریسالیس (ب.ت. وەک هی پەپوولە یان پەپوولەی شەوگەڕ moth؛

بنەڕەت: لە *chrysal(l)id- ،chrysal(l)is* لاتین، لە *khrusallis* یۆنانی، لە *khrusos* "زێڕ") ◌ پیله، نوچه

**chrysanthemum** /krɪˈsænθəməm, US -ˈzæn-/ *noun, pl.* chrysanthemums
قاسدەپاییز، گوڵەزێڕینە، داوودی [توخمەکانی *Chrysanthemum* یان (جۆری زۆرترین چینراوی) *Dendranthema*] ◌ گل داوودی

**Chryseis** *noun,* Latin, from Greek *Chrysēis*
چریسێیس، کریسێیس: کچی قەشەیێکی ئاپۆلۆ Apollo لە کتێبی ئیلیاد Iliad دا، ئاگامێمنۆن Agamemnon لە ترۆی دەیگرێ و دەیبا بەڵام دواتر دەنێردرێتە بۆ لای باوکی (میتۆلۆژی یۆنان) ◌ کریسئیس

**chryselephantine** /ˌkrɪselɪˈfæntaɪn/ *adjective*
(بەیەکەری یۆنانی کۆن) زێڕوماهی، زێڕوشفرەیی (بنەڕەت: لە *khruselephantinos* یۆنانی، لە *khrusos* "زێڕ" + *elephant- ،elephas* "فیل یان ماهی (شفرە) ivory") ◌ کریسلیفانتین

**chrysoberyl** /ˌkrɪsə(ʊ)ˈberɪl/ *noun*
زمروتەزێڕینە: کانێکی سەختی بۆرباو یا سەوزی زەردباو کە لە ئۆکسایدێکی بێریلیۆم beryllium و ئالۆمینیۆم پێکهاتووە ◌ کریسوبریل

**chrysocarpous** *adjective*
زێڕینبەر، خاوەنی میوەی زێڕین ◌ کریسوکارپوس

**chrysocolla** /ˌkrɪsə(ʊ)ˈkɒlə/ *noun*
کریسۆکۆلا: کانێکی شینی سەوزباو، لە سیلیکاتی مسی هایدراتید پێکهاتووە (بنەڕەت: لە *khrusokolla* یۆنانی، ئاماژە بە کانزایێ کە سەردەمانی زوو بۆ جۆشدان یان لەحیمکردنی زێڕ بەکار دێنرا) ◌ کریسوکولا

**chrysocolla** /ˌkrɪsə(ʊ)ˈkɒlə/ *noun*
سرێشە زێڕینە: کانێکی شینی سەوزباو، لە سیلیکاتی مسی هایدراتید پێکهاتووە $CuSiO_3.2H_2O$ ◌ کریسوکولا

**chrysolite** /ˈkrɪsəlaɪt/ *noun*
بەردەزێڕینە (بنەڕەت: لە *chrysolithus* لاتین، لەسەر بنچینەی *khrusos* یۆنانی "زێڕ" + *lithos* "بەرد") ◌ زبرجد

**chrysolitic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە بەردەزێڕینەوە هەیە ◌ وابسته به زبرجد

**chrysomelid** *noun, adjective*
زەردەقالۆنچە: خێزانی بەربڵاوی (Chrysomelidae) قالۆنچە چکۆلە، زۆرتر هێلکەیی و لووس و ورشنەکان، لە تەواو دنیاشدا بڵاو بوونەتەوە (وەک Colorado potato beetle) ◌ کریسوملید

**chrysomonad** *noun*
قەوزەی ئاوی شیرینی پۆلی Chrysomonadales، تەنیا یان بە شێوەی کۆلۆنی (پوورەژی) دەژین ◌ کریسوموناد

**chrysophyte** *noun*
قەوزەی قاوەیی زەرد یان زێڕین، زێڕینڕووەک، زێڕینگیا: قەوزی زەردی قاوەییڕەنگی لقی Chrysophyta، بەهۆی سێ کۆمەڵی ڕەنگی کلۆرۆفیل chlorophyll، کارۆتین carotene و زانتۆفیل xanthophyll لێک دەکرێتەوە ◌ کریسوفیت

**chrysoprase** /ˈkrɪsə(ʊ)preɪz/ *noun*
کوڕادەزێڕینە: جۆرێ ئاقیقی سپی کە نیکلی تیایە ◌ کریسوپریز

**chrysotile** /ˈkrɪsə(ʊ)taɪl/ *noun*
ریشاڵەزێڕینە: کانێ کە لە جۆرێ هەوریشمی ریشاڵاوی سێرپێنتین serpentine پێکهاتووە ◌ کریسوتایل

**chthonic** /ˈ(k)θɒnɪk/ *adjective,* also chthonian /ˈ(k)θəʊnɪən/
سەربە یان دانیشتووی دۆزەخ، سەربە دۆزەخنشین، دۆزەخنشین، دانیشتووی ژێرعەرز ◌ کتونیک، ساکن زیر زمین

**chub** /tʃʌb/ *noun*
چاب (جۆرێ ماسی ڕووبار [ *Leuciscus cephalus*]) ◌ چاب

**chubbiness** /ˈtʃʌbinəs/ *noun*
خڕپنی، گووپنی، خڕوخۆڵی، خڕپنی، خەپەرەیی ◌ تپلی

**chubby** /ˈtʃʌbi/ *adjective* (chubbier, chubbiest)
خڕپن، خەپەتۆڵە، گووپن، خڕوخۆڵ، خڕپنە، خەپەرە ◌ تپل

**chub-faced** *adjective*
سەروچاوپان ◌ رخسارپهن

**chuck**[1] /tʃʌk/ *noun*
وەدەرنان، دەرکردن ◌ بیرون‌اندازی

**chuck**[2] /tʃʌk/ *noun*
باوانەکەم، گیانەکەم ◌ عزیزم

**chuck**[3] /tʃʌk/ *noun*
1 گیرە یان قولاپێ بۆ ڕاگرتنی مەتە لە دەزگایێدا، گیرە، مەهار 2 گۆشتی سەرشان یان سەردەس (ولاخ) ◌ 1 مرغک 2 گوشت سردست

**chuck**[4] /tʃʌk/ *noun*
دەسلێدانی بە شۆخی ژێرچەناگە یان بەرخەبەبە ◌ چاک

**chucker-out** *noun*
کەڵەگا، شەڕڕاپەڕێن (لە شوێنە گشتی و کابارە و مەیخانەکاندا) ◌ گردن‌کلفت

**chuck-full** = chock-full

**chuckhole** *noun*
قولکە، کون، چاڵ (لەسەر ڕێگا) ◌ گودال

**chuckle** /'tʃʌkl/ *noun*
پێکەنین، خەنین، خەنە ◌ خندە

**chucklehead** = blockhead

**chuck wagon** *noun*
واگـۆنی ئاشـپەز، چێشـتخانـەی گـەڕۆک ◌ واگون چاک

**chuckwalla** /'tʃʌkwɒlə/ *noun*
(گیانـەوەرناسـی) مارمێلکـەیێکی رەشـی زلـەی باشـووری رۆژاوای ئـەمریکا و مەکـسیکۆ [*Sauromalus obesus*] ◌ چاکوالا

**chuddar** = chador

**chufa** /'tʃu:fɔ/ *noun*
1 جۆرێ sedge (سەلکداری خۆراکی، لە زۆر ناوچـەی زەلکـاوی سپانیا و ئیتالیـا دەچێـنرێ 2 ([*Cyperus esculentus var. sativus*] سەلک یان ئاولەی ئەو گیایە ◌ چوفا

**chuffed** /tʃʌft/ *adjective*
(نافەرمی) شاد، بەکەیف، خۆش، دەمبەپێکەنین، دلشاد، خۆشحاڵ، لەگوڕ ◌ مسرور، بشاش

**chug** /tʃʌg/ *noun*
تەپەتەپ، پتەپت (وەک شەمەندەفەر) ◌ پتپت

**chuka** *noun*
پۆتینی نووکهەلگەڕاو یان پەنجەقیت ◌ چوکا

**chukar** /'tʃʊkɑ:/ *noun*, also chukor
جۆرێ کەو، دەنگی لە مریشک دەچێ [توخم *Alectoris*: دوو جـۆرن] (بنـەڕەت: لـە *cakora* سانسکریتەوە) ◌ چوکار

**Chukchi** /'tʃʊktʃi:/ *noun*, also Chuckchee, *pl.* same or Chukchis
1 ئەندامی گەلێکی رەسەنی ئەوپەری باکووری رۆژهەلاتی سیبیریا 2 زمانی ئەو گەلە، سەربە کۆمەڵـەزمانێکی چکۆلـە، هـەروەها Koryak دادەگرێ ◌ چوکچی

**chum**[1] /tʃʌm/ *noun*
1 هـەوال، دۆسـت، یـار، رەفیـق (گیـانیگیـانی)، دەمساز 2 هاودیو، ئاوژوور ◌ 1 دوست، رفیق 2 هماتاقی

**chum**[2] /tʃʌm/ *noun, pl.* same or chums, also chum salmon
جۆرێ سەلمونی گەورەی پاسیفیکی باکووری، وەکـوو ماسـیێکـی خـۆراکی گرنگـە [*Oncorhynchus keta*] ◌ چام

**Chumash** /'tʃu:maʃ/ *noun, pl.* same or Chumashes
1 ئەنـدامی گـەلێکی سووورپێـستی بەشـە کـەناریـیەکانی باشـووری کالیفۆرنیـا 2 زمـانی تیاچووی Hokanی ئەو گەلە ◌ چوماش

**chummily** /'tʃʌməli/ *adverb*
گەرمانە، دۆستانە، گەرموگوڕانە ◌ دوستانە

**chumminess** /'tʃʌminəs/ *noun*
دۆستایەتی، هەوالەتی ◌ رفاقت

**chummy** /'tʃʌmi/ *adjective*
دۆستانە، خۆمانە، گەرموگوڕ ◌ دوستانە، گرم

**chump** /tʃʌmp/ *noun*
1 مـرۆی گـەوج و کـەر 2 کۆلکـە، کۆتـەرە 3 پارچە، لەت، کوت (گۆشت) ◌ 1 آدم احمق 2 کندە (چوب) 3 تکە

**chump change** *noun*
(نافەرمی) برێکی یەکجار کەمی پارە ◌ مبلغ بسیار کم

**chunder** /'tʃʌndə(r)/ *noun*
رشانەوە، هێنانەوە، یەقکردنەوە ◌ استفراغ

**chunk** /tʃʌŋk/ *noun*
1 پارچـە، کـوت، لـەت، کـەرت، قـاش 2 برێکی زۆر، کۆڵێ ◌ 1 قطعە، تکە 2 مقدار زیاد

**chunky** /'tʃʌŋki/ *adjective* (chunkier, chunkiest)
قـورس و ئەسـتوور، تێـکسـمراو، لەسـەریەک، لەتگەورە ◌ سنگین و کلفت، دارای تکـەهـای بزرگ

**chuppah** /'xʊpə/ *noun*, also chuppa, *pl.* chuppot /'xʊpəʊt/
چـەترێ کـە لـەژێریا رێورەسـمی زەمـاوەنـد و ژنومێردایەتی جووەکان بەڕێوەدەچێ ◌ چوپا

**church** /tʃɜ:tʃ, US tʃɜ:rtʃ/ *noun*
1 کلێسـە، کلیسـا 2 رێورەسـمی کلێسـەیی یـان دینـی، خواپەرسـتی 3 دیـن، ئـایـنزا 4 کۆمەڵـی دینی کریستیەنەکان، گرووپی ئایینگـەری ◌ 1 کلیسا 2 مراسم کلیسایی یا مذهبی، عبادت 3 دین، مذهب 4 روحانیت

**the Church** /tʃɜ:tʃ, US tʃɜ:rtʃ/ *noun*
1 قەشەکانی ئایینی دیانی 2 جیهان یان دنیای کریـستانیەت 3 دەزگـا یـان ئەنـستیتۆی ئـایینی دیـانی 4 کۆمەڵـی تایبـەتی دیـانییـەکان 5 کریستانیەت، دیانێتی ◌ 1 کشیشهـای مـذهب مـسیحیت 2 جهان مـسیحیت 3 مؤسـسـەی مـذهبی مـسیحی 4 جامعەی مخصوص مسیحیان 5 مسیحیت

**Church Commissioners** *noun, pl.*
دەستەی بەڕێوەبەری دارایی کلێسـەی ئینگلتـەرە ◌ اهل کلیسا

**churchgoer** /'tʃɜ:tʃgəʊə(r), US 'tʃɜ:rtʃgoʊər/ *noun*
کلێسەڕەو، ئەهلی کلێسـە، فێرەکلێسـە ◌ اهل کلیسا

**churchgoing** *noun*
کلێسـەڕەوی، فێرەکلێسەیی، بۆ کلێسـەچوویی ◌ اهل کلیسا بودن

**churchman** /'tʃɜ:tʃmən, US 'tʃɜ:rtʃ-/ *noun, pl.* churchmen
1 قەشە 2 ئەندامی کلێسـە ◌ 1 کـشیش 2 عـضو کلیسا

**Church of England** *noun*

کلێسەی ئینگلتەرە ◌ کلیسای انگلستان
**Church of Scotland** *noun*
کلێسەی سکاتلەند ◌ کلیسای اسکاتلند
**church school** *noun*
خوێندنگای کلێسە ◌ مدرسەی کلیسا
**Church Slavonic** *noun*
زمانی ئایینی کلێسەی ئۆرتۆدۆکسی رووسیا، سیبیریا و هێندێ ولاتی تر ◌ چرچ اسلاوونیک
**churchwarden** /ˌtʃɜːtʃˈwɔːdn, US ˌtʃɜːrtʃˈwɔːrdn/ *noun*
بەرپرسی (کاروباری) دارایی کلێسە (لە لایەن ئەندامانی کلێسەوە هەڵبژێردراوە) ◌ متولی
**churchwoman** /ˈtʃɜːtʃwʊmən, US ˈtʃɜːrtʃ-/ = clergywoman
**churchy** *adjective*
1 یەکجاربەدین، کلێسەپەرست، پارێزگای نونەرەو 2 کلێسەئاسا ◌ 1 متقی افراطی 2 کلیسامانند
**churchyard** /ˈtʃɜːtʃjɑːd, US ˈtʃɜːrtʃjɑːrd/ *noun*
1 قەبرستانی کلێسە 2 حەوشەی کلێسە ◌ 1 گورستان کلیسا 2 حیاط کلیسا
**churchyard beetle** *noun*
قالۆنچەی حەوشەی کلێسە: جۆرێ قالۆنچەرەشە (ی نەفر کە لە جێی تاریک و تەڕا دەژی [*Blaps mucronata*]) ◌ نوعی سوسک
**churidars** /ˈtʃʊrɪdɑːz/ *noun, pl.*
جۆرێ شەلواری تەنگ (خەڵکی نیمچەوشکاری هێند لەبەری دەکەن) ◌ نوعی شلوار
**churinga** /tʃʌˈrɪŋgə/ *noun, pl.* same or churingas
(لەنێو سەرەتانشینانی ئەوسترالیادا) نووشتە یان تەلەسمی پیرۆز (یان شتێکی تر) ◌ چورینگا
**churl** /tʃɜːl, US tʃɜːrl/ *addjective*
1 (کۆن) دیهاتی، لادێیی 2 بێڕەوشت، بێماریفەت 3 رووتاڵ 4 (زوو، ceorl) پیاوێکی ئازاد بە خوارترین پلە ◌ 1 دهاتی 2 بی‌ادب 3 بدعنق 4 چرل
**churlish** /ˈtʃɜːlɪʃ, US ˈtʃɜːrlɪʃ/ *adjective*
1 بێڕەوشت، بێماریفەت 2 رووهەڵماڵراو، رووداڕ 3 رووتاڵ، رووناخۆش، مرومۆچ ◌ 1 بی‌ادب 2 گستاخ 3 بدعنق
**churlishly** /ˈtʃɜːlɪʃli, US ˈtʃɜːrlɪʃli/ *adverb*
بێڕەوشتانە ◌ بی‌ادبانە
**churlishness** /ˈtʃɜːlɪʃnəs, US ˈtʃɜːrlɪʃnəs/ *noun*
1 بێڕەوشتی، بێماریفەتی 2 رووتاڵی، رووناخۆشی ◌ 1 بی‌ادبی 2 بدعنقی
**churn** /tʃɜːn, US tʃɜːrn/ *noun*
1 مەشکە، کەرەگر (دەزگا یان دەفر)، شیرژەن(ە) 2 شیردان، شیربەرە (بنەڕەت: *cyrin* ئینگلیسی کۆن، ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ 1 کرەگیر 2 کانتینر شیر
**churr** = chirr
**churrasco** /tʃʊˈraskəʊ/ *noun*
چێشتێکی ئەمریکای باشووری ◌ نوعی غذای امریکای جنوبی
**Churrigueresque** /ˌtʃʊərɪgəˈrɛsk/ *adjective*
شێری گوارایانە: سەربە شێوازی مێعماری بارۆک لە سپانیا و کۆلۆنییەکانی لە دوایییەکانی سەدەی 17 و سەرەتاکانی سەدەی 18 (بنەڕەت: لە ناوی مێعمار و پەیکەرتاشی سپانیایی سەدەی 17 José Benito de *Churriguera* 1650–1725) ◌ شریگورسک
**chute**[1] /ʃuːt/ *noun*
1 خزێنە 2 داخزان 3 پلووسک، پلووورە(ە)، لووساوک 4 جۆگە یان بۆری (لوولە)ی خوار 5 لێژ (ی توند)، تەلان، (ئاست) لاپێ ◌ 1 سرسرە 2 افت 3 ناودان 4 مجرا یا لولەی مایل 5 (سطح) شیب
**chute**[2] /ʃuːt/ *noun*
(نافەرمی) 1 چەتر (رزگاربوون) 2 = spinnaker ◌ چترنجات
**Chutes and Ladders** = snakes and ladders
**chutney** /ˈtʃʌtni/ *noun, pl.* chutneys
چاتنی (تێکەڵەیەکی میوەی تێژە) ◌ چاتنی
**chutist** *noun*
(نافەرمی) چەترباز، چەترەوان ◌ چترباز
**chutzpah** /ˈxʊtspə, US ˈhʊ-/ *noun*
1 هوتسپا، وێران، ئازایەتی 2 رووداری ◌ 1 شهامت 2 گستاخی
**Chuvash** /ˈtʃuːvɑːʃ/ *noun, pl.* same
1 ئەندامی گەلێ کە لە Chuvashia (کۆماریکی خۆبەڕێوەبەری رووسیا) دەژین 2 زمانی Turkicی ئەو گەلە ◌ چوواش
**chyle** /kʌɪl/ *noun*
(کارئەندامناسی) شیراوک: شلەیێکی شیری milky کە لە ریخۆڵە چکۆلەدا بەدرێژایی هەرس دەچێتە نێو دەزگای لیمفی یان لەشاوی (بنەڕەت: لە late Latin *chylus* لە *khūlos* یونانی "juice") ◌ کیلوس
**chyliferous vessel** *noun*
شیراوکەرێ، رەگی شیراوک(هەڵگر) ◌ مجرای کیلوس‌بر
**chylification** *noun*
شیراوکان، بوونەشیراوک، گۆڕان بۆ شیراوک ◌ کیلیفیکاسیون
**chylomicron** *noun*
وردەشیراوک: وردەدلۆپی لیپۆپرۆتین lipoprotein کە لە ریخۆڵە چکۆلەدا پێکدێ و چەوری لە لەشاوەوە دەبا بۆ خوێن ◌ کیلومیکرون
**chylous** *adjective*

(کارئەندامناسی) شیراوکی ۞ کیلوسی
**chyme** /kʌɪm/ *noun*
(کارئەندامناسی) ئاوگ، کیموس، کیمۆس: شلەیێ کە لە میعدەوە دەچێتە نێو ریخۆڵە چکۆڵە و لە ئاوگە میعدەییەکان gastric juices و بەشێ لە خۆراکی هەرس کراو پێکهاتووە (بنەرەت: لە late Latin *chymus* لە *khūmos* یۆنانی "juice") ۞ کیموس
**chymification** *noun*
بەکیموس‌بوون، ئاوگاندن، بوونەئاوگ، کیمۆسان ۞ کیمیفیکاسیون
**chymopapain** *noun*
هەوێنەیێکی پاپایا papaya کە دەتوانێ پروتێین شی کاتەوە ۞ کیموپاپاین
**chymotrypsin** /ˌkʌɪmə(ʊ)'trɪpsɪn/ *noun*
کیمۆتریپسین: جۆرێ هەوێنەی شیلاوکی کە پرۆتێینەکانی نێو ریخۆڵە چکۆلە تێک دەشکێنی یان شی دەکاتەوە ۞ کیموتریپسین
**chymotrypsinogen** *noun*
کیمۆتریپسینۆژێن: هەوێنەیێ کە لە لایەن شیلاوکەوە دەردەدرێ و بەهۆی تریپسینەوە دەگۆردرێ بۆ کیمۆتریپسین ۞ کیموتریپسینوژن
**chymotryptic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە کیمۆتریپسینەوە هەیە ۞ وابسته به کیموتریپسین
**chymous** /kʌɪməs/ *adjective*
ئاوگی، کیمۆسی، ئاوک‌ئاسا، شێوەکیمۆس ۞ کیموسی، کیموس‌مانند
**chypre** /ʃiːpr(ə)/ *noun*
گوڵاوی sandalwood ۞ شیپر
**chytrid** *noun*
هەریەک لە کارگە ئاوی یان خاکی‌یەکانی پۆلی Chytridiomycetes، خاوەنی کۆمەڵە zoospore یکی شێلاق‌دارن ۞ کیترید
**CIA** /ˌsiː aɪ 'eɪ/ *abbreviation* Central Intelligence Agency
(ئەمریکا) سی‌ئای‌ئێی (ئاژانسی هەواڵ‌گری ناوەندی) ۞ سی‌آی‌ای
**ciabatte** /tʃə'bɑːtə/ *noun*
نانی ئیتالیایی (لەگەڵ رۆنی زەیتوون دەکرێ) ۞ سیابات
**ciao** /tʃaʊ/ *interjection*
(نافەرمی، ئیتالی) خوات لەگەڵ ۞ خداحافظ
**ciborium** /sɪ'bɔːrɪəm/ *noun, pl.* ciboria /-rɪə/
1 ئاسمانە، قوبە، گومەز (لەزوور میحرابی کلێسەوە کە چوار کۆڵەکە رایگرتووە، هەروەها baldachin) 2 دەفر، جام، قاپ (بۆ هەڵگرتنی نان یان wafer ی پیرۆزی شێوی خواوەندی) ۞ 1 قبه 2 ظرف
**cicada** /sɪ'kɑːdə, US sɪ'keɪdə/ *noun*
جیک‌جیکە؟، زیکزیکە، سیرەرەشە، بەرزەچرە، سیسرکەدەشتە، چرچر(ە)، بەرزەجرە [خێزان Cicadidae: زۆر جۆرن] ۞ زنجره
**cicatrice** /'sɪkətrɪs/ *noun*
جێ‌برین، گرێ، شوێنەزام، ئالگ ۞ اثر زخم
**cicatricial** /sɪkə'trɪʃ(ə)l/ *adjective*
ئالگی، سەربە جێ‌برین، نیشانەدار، داخاوی، گرێ‌گرێ، سەربە یان پێوەندی بە cicatrix ەوە هەیە ۞ وابسته به اثر زخم، داغ‌دار
**cicatrization** /ˌsɪkətraɪ'zeɪʃn/ *noun*
ساڕێژبوون، چابوون(ەوە)، گۆشتەوزوون، خووزهێنانەوە، سوێ ۞ التیام
**cicatrix** /'sɪkətrɪks/, *pl.* cicatrices /-'trʌɪsiːz/
1 جێ‌برین، گرێ، شوێنەزام، ئالگ، نیشان، داخ 2 (رووەک‌ناسی) نیشانەیێ لەسەر لاسک یان قەدێ کە پا لێ‌کرانەوەی گەڵا یان بەشێکی تر دەمێنێتەوە، گرێ ۞ 1 اثر زخم، داغ 2 سیکاتریکس
**cicely** /'sɪsɪli/ *noun,* also seeet cicely, *pl.* cicelies
سۆلەکە، گیایێکی گوڵ‌سپی بۆن‌خۆش، لە تیرەی parsley، گەڵاکانی شێوەی fern دەدەن [*Osmorhiza* (ئەوروپا)، *Myrrhis odorata* (ئەمریکای باکووری)، و جۆرەکانی *claytoni* تر] ۞ سیسیلی
**cicerone** /ˌtʃɪtʃə'rəʊni, US ˌsɪs-/ *noun, pl.* ciceroni pronunc. same
شارەزا، بەڵەد، رێنوێن ۞ راهنما
**Ciceronian** /ˌsɪsə'rəʊnɪən/ *adjective*
1 تایبەت بە بەرهەم یان بیری Cicero (-106 43 پێش‌زایین)، نووسەر و وتاربێژی رۆمی کۆن 2 (وتار یان نووسراوەیێ) بەپێی شێوازێکی کێش‌دار و رەوان ۞ سیسرونی
**cichlid** /'sɪklɪd/ *noun*
(گیانەوەرناسی) جۆرێ درکەماسی perch-like ئاوە شیرینەکان، لە خێزانێکی بەربڵاوی گەرمێنان (Cichlidae) ۞ نوعی ماهی
**CID** *abbreviation* Criminal Investigation Department
سی‌ئای‌دی (= بەشی لێکۆڵینەوەی تاوان‌کاری) ۞ سی‌آی‌دی
**-cide** *suffix*
پاشگر: 1 ـکوژ، ـفەوتێن: *insecticide* 2 کوشتن، فەوتاندن، ـکوژی، ـفەوتێنی: *suicide* (cidal-: ئاوەڵناو ساز دەکا: کوژ، فەوتێن، کوژەر، لەنێوبەر، بکوژ؛ cidally-: ئاوەڵکار ساز دەکا؛ بنەرەت: بە رێگای فەرەنسەوە، واتای یەک لە *cida*- لاتین، واتای دوو لە *cidium*- لاتین، هەردووکیان لە *caedere* لاتینەوە "کوشتن") ۞ پسوند: 1 کش 2 عمل کشتن، کشی
**cider** /'saɪdə(r)/ *noun*

1 سایدر، سێواوگ، خۆشاوی سێو، سێواو (خواردنەوەیەکی ئەلکۆلی) 2 شووشەسایدر ۞ 1 سیدر 2 بطری سیدر

**cider-press** *noun*
دەزگای سێواوگرتن یان سیدرگیری، سێوگوش ۞ ماشین سیدرگیری

**ci-devant** /ˌsi:dəˈvɒ̃, French sidvɑ̃/ *noun*
پێشوو، لەوەپێش، بەرین ۞ قبلی

**cif** *abbreviation* cost, insurance, freight
سی‌ئای‌ئێف (= نرخ و تێچوونی بیمە و راگوێستن) ۞ سی‌آی‌اف

**cigar** /sɪˈgɑ:(r)/ *noun*
سیگاری بەلگ یان گەلاتووتن ۞ سیگار برگ

**cigarette** /ˌsɪgəˈret, US ˈsɪgəret/ *noun*, also cigaret
جگەرە، سیگار (بنەڕەت: لە فەرەنسی، چکۆلێنراوی *cigare* "cigar") ۞ سیگار

**cigarette butt** = cigarette end

**cigarette-case** *noun*
بەستە سیگار، قوتوی جگەرە، قوتوجگەرە ۞ جاسیگاری

**cigarette end** *noun*
بنەجگەرە، ئاغزە، کنگەسیگار، قنچکەجگەرە ۞ تە سیگار

**cigarette holder** *noun*
مۆنتە، مۆدنە، دارجگەرە ۞ چوب سیگار

**cigarette lighter** *noun*
چەرخ، فەندەک ۞ فندک

**cigarette pants** *noun, pl.*
جۆرێ شەلواری راستە و لنگ‌باریکی ژنانە ۞ نوعی شلوار زنانە

**cigarette paper** *noun*
پەرەسیگار، کاغزی سیگار، کاغزسیگار ۞ کاغذ سیگار

**cigarillo** /ˌsɪgəˈrɪləʊ/ *noun, pl.* cigarillos
سیگارچە، سیگاروکە، سیگاری چکۆلە ۞ سیگار کوچک

**ciggy** /ˈsɪgi/ *noun, pl.* ciggies
(نافەرمی) جگەرە، سیگار ۞ سیگار

**ciguatera** /ˌsɪgwəˈtɛ:rə/ *noun*
جۆرێ ژاراویبوون کە بەهۆی خواردنی جۆری ماسی دەریایی گەرمێنانەوە تووش دەبێ (dinoflagellate ژاراوی پێیە) ۞ سیگوترا

**cilantro** /sɪˈlantrəʊ/ *noun*, also coriander
(ب.ت. لە ئاشپەزی مەکسیکی‌دا، گەلا) گژنیژ، تاولە ۞ گشنیز

**cilia** = plural form of cilium

**ciliary** /ˈsɪlɪəri/ *adjective*
برژانگی، مژۆلی ۞ مژگانی

**ciliary body** *noun*
(توێکاری) تەنی برژانگی یان مژۆلی: بەشێ لە چاو کە رەشێنە iris بە پەردەی چاوەوە choroid دەبەستێتەوە ۞ جسم مژەای

**ciliary movement** *noun*
(زیندەناسی) جوولە یان بزاوتی برژانگی یان مژۆلی ۞ حرکت مژەای

**ciliary muscle** *noun*
(زیندەناسی) ماسوولکەی برژانگی یان مژۆلی ۞ عضلەی مژەای

**Ciliata** *noun, pl.*
(گیانەوەرناسی) برژانگ‌داران، مژۆلداران ۞ مژەداران

**ciliate** /ˈsɪlieɪt/ *noun, adjective*, also ciliated
(گیانەوەری) برژانگ‌دار، مژۆلدار، مژۆلوەر ۞ (جانور) مژەدار، مژەدار

**ciliated cell** *noun*
(زیندەناسی) خانەی برژانگ‌دار یان مژۆلدار ۞ سلول مژەدار

**ciliated funnel** = nephrostome

**cilice** /ˈsɪlɪs/ = haircloth

**cilium** /ˈsɪlɪəm/ *noun, pl.* cilia /-lɪə/
(گیانەوەرناسی) برژانگ، مژۆل، وردەموو، کولک (بنەڕەت: لە لاتینەوە) ۞ مژە

**cill** = (chiefly Building) variant spelling of sill

**cimbalom** /ˈsɪmb(ɔ)l(ə)m/ *noun*
(موسیقا) dulcimerی گەورەی هەنگاریایی ۞ نوعی قانون

**cimetidine** /sʌɪˈmɛtɪdi:n/ *noun*
سایمێتیدین: دەرمانێکی ئانتی‌هیستامین $C_{10}H_{16}N_6S$ بۆ تیماری ئەسیدیتەی میعدە و برینە هەرسی‌یەکان بەکاردێتێ ۞ سیمتیدین

**Cimmerian** *noun, adjective*
*n* سیمێری، کیمێریۆی *Kimmerioi* (یۆنانی): هەریەک لە گەلانی سیمێری Cimmerii کە هۆمێر وەک دانیشتووی ناوچە و دەڤەرە دوورەکانی مژ و تاریکی باسیان دەکا *adj* (یەکجار) تاریک، ئەنگوستەچاو، تاریکستان، شەوەزەنگ ۞ *n* سیمرین *adj* تاریک، ظلمانی

**C-in-C** *abbreviation* Commander in Chief
سەرفەرماندار، فەرمانداری گشتی ۞ فرماندەی کل قوا

**cinch** /sɪntʃ/ *noun*
1 کاری ئاسان 2 زۆر دیار، وەک رۆژی روون، شت یان بابەتی مسۆگەر 3 کەژوو، کەژک ۞ 1 کار سادە 2 امر مسلم 3 تَنگ (اسب)

**cinchona** /sɪŋˈkəʊnə/ *noun*
(رووەکناسی) داری یاوکوژ، دەرمانەلەرز، توێخڵی یاوکوژ (alkaloidەکانی (وەک quinine) تیایە؛ بنەڕەت: لە ناوی کۆنتێسی *Chinchón* کە ئەو دەرمانەی بۆ (ئی)سپانیا برد) ۞ درخت یا پوست گنەگنە

**cinchonism** *noun*

زاراویبوون به یاوکوژ ۞ مسمومیت با گنه‌گنه
**Cinco de Mayo** *noun*, Spanish, fifth of May
سینکۆ دو مایۆ: جەژن یان ڕێورەسمێکی مەکسیکی و ئەمریکییە مەکسیکییەکان، لە ڕۆژی 5ی مایسدا بە یادی سەرکەوتنی مەکسیکییەکان بەسەر فەرەنسەدا لە Puebla لە 1862 ۞ سینکو دو مایو
**cincture** /'sɪŋktʃə/ *noun*
1 قەیاسە، پشتێن، کەمەربەند، ئالقە، کەمە، دەوربەست، belt ،girdle 2 دەوردان، ئابلۆقە، گەمارۆ 3 (بیناسازی) ئالقە ۞ 1 کمربند 2 محاصره 3 سینکتور
**cinder** /'sɪndə(r)/ *noun*
1 سەرەبزووت، بزووت، خەڵووزی یان داری سەرەبزووت: *The logs had turned into blackened cinders* 2 کوزەر، کوزەرە، خڵتە (تواندنەوەی کانزا) 3 سکل، پەنگر، پشکۆ 4 (cinders) خۆڵەمێش، بوور، ژیلەمۆ ۞ 1 چوب نیم‌سوز 2 تفاله، سرباره 3 اخگر 4(درجمع)خاکستر
**Cinderella** /ˌsɪndə'relə/ *noun, adjective*
منالی هەتیو (یان بێناز، کەسێ یان شتێ کە سەرنجێکی وای پێنەدراوە، لە ناوی ژنەقارەمانی داستانە پەرییەکانی ئەوروپایی) ۞ سیندرلا
**cindery** *adjective*
خۆڵەمێش‌ئاسا،خۆڵەمێشی،لە خۆڵەمێش‌پێکهاتوو ۞ خاکسترمانند، متشکل از خاکستر
**cine** /'sɪni/ *adjective, combining form*
1 سەربە فیلم و پیشەسازی فیلم و سینەما (cine-) 2 cinematographic وەک (combining form ۞ وابسته به فیلم و صنعت فیلم و سینما
**cineaste** /'sɪnɪast/ *noun*, also cineast
سینەماپەرست، هۆگری سینەما ۞ مشتاق سینما
**cine-camera** *noun*
دووربین یان کامێرای فیلمهەڵگری ۞ دوربین فیلمبرداری
**cine-film** *noun*
فیلمی کامێرای فیلمهەڵگری ۞ فیلم دوربین فیلمبرداری
**cinema** /'sɪnəmə/ *noun*
سینەما، فیلمسازی، فیلمدروس‌کردن، سینەماگەری ۞ سینما، فیلمسازی
**cinema-goer** = film-goer
**cinematheque** /ˌsɪnɪmə'tek/ *noun*
1 فیلمخانە یان ئارشیفی فیلم، سینەماتێک 2 سینەمای چکۆلانە ۞ 1 آرشیو فیلم 2 سینمای کوچک
**cinematic** /ˌsɪnə'mætɪk/ *adjective*
سینەمایی، تایبەت بە سینەما: -nematic *effects/techniques* ۞ سینمایی

**cinematically** /ˌsɪnə'mætɪkli/ *adverb*
لەباری سینەماییەوە ۞ از لحاظ سینمایی
**cinematograph** /ˌsɪnəmətə'græfɪk/ *noun*, aslo kinematograph
1 سینەمایی 2 کامێرای فیلمهەڵگری 3 فیلمدروس‌کردن، فیلمسازی، سینەماگەری ۞ 1 سینمایی 2 دوربین فیلمبرداری 3 فیلمسازی
**cinematography** /ˌsɪnəmə'tɒgrəfi, US -'tɑːg-/ *noun*
1 سینەماگەری، فیلمسازی 2 فیلمهەڵگری
cinematographer /ˌsɪnəmə'tɒgrəfə(r), US -'tɑːg-/ n: فیلمهەڵگر؛ cinematographic adj: 1 سەربە سینەماگەری، سەربە فیلمسازی 2 سەربە فیلمهەڵگری؛ (cinematographically *adv* ۞ 1 فیلمسازی 2 فیلمبرداری
**cinéma-vérité** /ˌsɪnɪmə'verɪteɪ, French sinemaveʀite/ *noun*
(فەرەنسی) شێوەیێکی فیلمسازی بەڵگەنامەیی کە لەودا دووربین کەس و ڕووداوە ڕاستەقینەکان بەبێ دەرهێنەرایەتی تۆمار دەکا ۞ سینما ورتی
**cineole**, also cineol = eucalyptol
**cinephile** *noun*
سینەمادۆست ۞ سینمادوست
**cineplex** = multiplex cinema
**cine-projector** *noun*
دەزگای پیشاندان (فیلم)، پیشاندەر، ئاپارات ۞ پروژکتور
**cineraria** /ˌsɪnə'rɛːrɪə/ *noun*
گیایێ لە تیرەی daisy [تۆخم *Pericallis* (جاران *Cineraria*)] ۞ سینره
**cinerarium** /ˌsɪnə'rɛːrɪəm/ *noun, pl.* cinerariums
شوێنی بۆ پاراستنی خۆڵەمێشی تەرمە مردووەکان، خۆڵەمێش‌خانە، بوورخانە، شوێنی ئەسپاردنی خۆڵەمێشی مردووان ۞ سیراریوم
**cinerary** /'sɪnərəri/ *adjective*
بەکارهێنراو بۆ پاراستنی خۆڵەمێشی تەرمە سووتاوەکان ۞ سینراری
**cinerary urn** *noun*
کاسەی خۆڵەمێش یان خۆشەمێشدانی مردوویێ دوای سووتانی (بنەڕەت: *cinerary* لە *cinerarius* لاتین "پێوەند بە خۆڵەمێش") ۞ خاکستردان
**cineration** /ˌsɪnə'reɪʃn/ *noun*
بوونەخۆڵەمێش، سووتان، بە خۆڵەمێش بوون ۞ خاکسترشدگی
**cinereous** /sɪ'nɪərɪəs/ *adjective*
سەربە خۆڵەمێش، خۆڵەمێشی، شێوەخۆڵەمێش ۞ وابسته به خاکستر
**Cingalese** /ˌsɪŋgə'liːz/ *noun, adjective* =

Sinhalese

**cingulate** *adjective*, also cingulated

پشتێن‌دار، پشتێنه‌دار، خاوه‌نی پشتێنه ◌ دارای کمربند

**cingulum** /'sɪŋgjʊləm/ *noun, pl.* cingula /-lə/

(توێکاری) پشتێن، پشتێنه، که‌مه‌ربه‌ند، ئاڵقه‌ی ره‌نگی: 1 چه‌پکه ریشاڵێکی ده‌ماری چه‌ماوی نێو مێشک 2 هێڵی ده‌وری پایه‌ی تاجی ددان 3 (رووه‌کناسی) به‌شێ له رووه‌ک نێوان لاسک و ریشه 4 (گیانه‌وه‌رناسی) به‌شی ده‌ره‌وه‌ی مۆزۆڵ یان بڕژانگ (cingular *adj*؛ بنه‌ڕه‌ت: له لاتینه‌وه "belt"، *cingere* "gird") ◌ کمربند، سینیگولوم

**cinnabar** /'sɪnəbɑː/ *noun*

1 کانێکی سووری گه‌ش که سولفایدی جیوه‌ی تیایه 2 (هه‌روه‌ها cinnabar moth) جۆرێ په‌پووله‌ی ڕۆژفڕی باڵ‌سوور و ره‌ش [ *Tyria jacobaeae*] ◌ 1 شنگرف 2 نوعی پروانه

**cinnamon** /'sɪnəmən/ *noun, adjective*

*n* 1 دارچینی، دارچین، دره‌ختی دارچین [*Cinnamomum zeylanicum*] 2 دارچین (ئاڵه‌ت) 3 ره‌نگی قاوه‌یی زه‌ردباو که شێوه‌ی سینامون ده‌دا *adj* (ره‌نگ) قاوه‌یی ئاماڵ زه‌رد ◌ *n* 1 دارچین، درخت دارچین 2 دارچین 3 رنگ قهوه‌ای مایل به زرد *adj* قهوه‌ای مایل به زرد

**cinque** /sɪŋk/ *noun*, also cinq

پێنج، سینک (ب.ت. له یاری ته‌خته یان په‌ڕین‌دا) ◌ سینک

**cinquecentist** *noun*

هونه‌رمه‌ند یا وێژه‌وانی سه‌ده‌ی شازده‌یه‌م ◌ هنرمند یا ادیب قرن شانزدهم

**cinquecento** /ˌtʃɪŋkwɪ'tʃɛntəʊ/ *noun*

سه‌ده‌ی شازده‌یه‌م (ب.ت. له هونه‌ر و وێژه‌ی ئیتالیایی) ◌ قرن شانزدهم

**cinquefoil** /'sɪŋkfɔɪl/ *noun*

1 (رووه‌کناسی) پێنج‌گه‌ڵا یان پێنج‌په‌ره 2 (هونه‌ر) نه‌خشی پێنج‌په‌ره یان په‌نجه‌یی ◌ 1 پنج‌برگ 2 آرایش پنجه‌ای

**Cinzano** /tʃɪn'zɑːnəʊ/ *noun*

(ناوی کاداری) vermouthی ئیتالیایی ◌ ورموت ایتالیایی

**CIO** *abbreviation* Congress of Industrial Organizations

کۆنگره‌ی ڕێکخراوه پیشه‌سازی‌یه‌کان ◌ کنگره‌ی سازمان‌های صنعتی

**cion** = US spelling of scion2

**cipher** /'saɪfə(r)/ *noun*, also sypher

1 نیشانه، هێما، ره‌مز، په‌رله، شفره، په‌یامی کۆدی 2 ژماره (له 1وه تا 9) 3 هیچ، سیفر 4 مرۆ یا شتی ناگرنگ و نزم، هیچه‌که (بنه‌ڕه‌ت: له عه‌ره‌بی *sifr* "بۆش، هیچ") ◌ 1 رمز، پیام رمزی 2 رقم 3 صفر 4 آدم یا چیز بی‌اهمیت و دون

**ciphered** *adjective*

په‌رله‌یی، ره‌مزی ◌ رمزی

**cipolin** /'sɪpəlɪn/ *noun*

پیوازه، پیازه، مه‌رمه‌ری ئیتالیایی (بنه‌ڕه‌ت: له فه‌ره‌نسه‌وه، له *cipollino* ئیتالیایی، له *cipolla* "پیواز یان پیاز") ◌ سیپولین

**circa** /'sɜːkə, US 'sɜːrkə/ *preposition*

نزیکه‌ی، له ده‌وروبه‌ری، approximately: *born circa 150 BC* (کورته‌که‌ی c؛ بنه‌ڕه‌ت: له لاتینه‌وه) ◌ در حدود

**circadian** /sɜː'keɪdiən, US sɜːr'k-/ *adjective*

شه‌ووڕۆژی، 24 کات‌ژمێره (یا سه‌عاته، سه‌ربه‌و کۆمه‌ڵه گۆڕانه‌ی له‌شی مرۆڤ و گیانه‌وه‌ران، له هه‌ر قۆناخێکی 24 کات‌ژمێره) ◌ شبانه‌روزی

**circadian rhythm** *noun*

(زینده‌ناسی) ریتمی شه‌ووڕۆژی، سووڕه شه‌ووڕۆژی‌یه‌کان ◌ نواخت شبانه‌روزی

**Circassian** /sə:'kasɪən/ *noun, adjective*

*n* 1 ئه‌ندامی کۆمه‌ڵێ له گه‌لانی زۆربه مسوڵمانی سوننی باکووری ڕۆژاوای که‌وکاز 2 هه‌ریه‌ک له دوو زمانی که‌وکازی باکووری ئه‌و گه‌له Adyghe و Kabardian *adj* سه‌ربه سیرکاسیه‌نه‌کان ◌ سیرکاسین

**Circe** *noun*

سیرسێ، کیرکێ: ژنه‌جادووگه‌رێ که پاڵه‌وانی ئۆدیسه‌ی کرده به‌راز و به‌ڵام له لایه‌ن ئۆدیسه‌وه ناچار کرا تا بیانگۆڕێته‌وه ◌ سیرسه

**circinate** /'sɜːsɪnət, US -eɪt/ *adjective*

1 (رووه‌کناسی) هه‌ڵپێچراو، لوول(بوو، به شێوه‌یێ که نووک یان سه‌ره‌که‌ی بکه‌وێته ناوه‌نده‌وه) 2 (پزشکی) خڕ، کەوانه‌یی circular (بنه‌ڕه‌ت: له -*circinat*، *circinare* "خڕهه‌ڵدان") ◌ سیرسینت

**circle** /'sɜːkl, US 'sɜːrkl/ *noun*

1 بازنه، جه‌غز، گاخ، خاز، ئاڵقه، چه‌مه‌ره، که‌مه‌ره، چه‌رخ، ده‌ور، گه‌ڕ، سوور، خول 2 بوار، پانتایی، مه‌ڵبه‌ند، ئاقار، راخسته 3 کۆڕ، گرووپ، کۆمه‌ڵ، ده‌سته 4 نهۆمی سه‌ره‌وه‌ی شانۆگا یا سینه‌ما (له *cercle* فه‌ره‌نسی کۆن، له *circulus* لاتین "ئاڵقه‌ی چکۆله"،چکۆلێنراوی *circus* "ئاڵقه") ◌ 1 دایره، حلقه، چرخه، دور 2 حوزه، گستره 3 محفل، جمع 4 بالکن

**circlet** /'sɜːklət, US 'sɜːrk-/ *noun*

1 نیمچه‌تاج، ئاڵقه‌ی جوانی 2 بازنۆکه، جه‌غزۆکه ◌ 1 حلقه‌ی تزیینی 2 دایره‌ی کوچک

**circs** = *noun, pl.* informal circumstances

**circuit** /'sɜːkɪt, US 'sɜːrkɪt/ *noun*

1 خولگه، سوورگه 2 ڕێڕه‌و، گێژه‌ن، ده‌ور 3 گه‌ڕان، سووڕان 4 مه‌یدان، گۆڕه‌پان 5 مه‌ڵبه‌ند،

ئاقار 6 دەرووبەر 7 یاری یان پێشبڕکێ خولی‌یەکان 8 کۆمەڵێ لە کلێسە میتۆدیستەکان کە یەکەیێکی بەڕێوەبەرایەتی پێکدێنن ۞ 1 مدار 2 مسیر، محیط 3 گردش 4 میدان 5 حوزه 6 پیرامون 7 بازی یا مسابقات دوره‌ای 8 سرکیت

**circuital** *adjective*
خولگەیی، سوورگەیی ۞ مداری

**circuit board** *noun*
تەختەخولگە، تەختەگێژەن ۞ صفحه مدار

**circuit breaker** *noun*
کلیلی دابڕینی خولگە، خولگەبڕ. تەزووبەند، دوگمە یان کلیلی دەرپەڕاندن ۞ مدارشکن

**circuit court** *noun*
دادگای گەڕۆک یا پیاچوونەوە ۞ دادگاه منطقه‌ای

**circuitous** /sə'kju:ɪtəs, US sər'k-/ *adjective*
پێچاوپێچ، خواروخێچ، بەپێچ‌وپەنا، لار، بەپێچ، درێژ و ناڕاستەوخۆ (circuitously /sə'kju:ɪtəsli, US sər'k-/ *adv*: پێچاوپێچانە، بەشێوەیەکی خوار و خێچ؛ circuitousness *n*) ۞ پیچ در پیچ

**circuitry** /'sɜ:kɪtri, US 'sɜ:rk-/ *noun, pl.* circuitries
خولگەمەنی، بازنەمەنی، بازنەبەندی، سیستەمی خولگەکان، کۆبازنەی کارەبایی (ڕێکخستەیەکی خولگە یان بازنە ئێلیکتریکی‌یەکان یان ئەو دەزگایەی کە تەوانە پێکدێنێ) ۞ مداربندی

**circular** /'sɜ:kjələ(r), US 'sɜ:rk-/ *adjective, noun*
*adj* 1 خڕ، گروڤەر، خڕۆک، چەمەری، ئالقەیی، سووری، چەرخی، خولی، گەڕی، خەپکەیی، بازنەیی، جەغزی، گەڕۆک، خولۆک، دەگەڕێ، دەخولێتەوە، وەرسوور: *a circular orbit* ◊ *a circular staircase* ◊ *circular building* ◊ 2 ناڕاستەوخۆ، بەپێچ‌وپەنا (گەشت و گەڕان)، circuitous، indirect 3 دەوری، لەسەر بنچینەی دەور(لێ)دانەوە (تیۆری یان بەڵگەهێنانەوە) *n* ئاگاداری، داخویانی، ڕاگەیاندن‌نامە (circularly *adv*) ۞ *adj* 1 گرد، حلقوی، چرخشی، دوری، دایره‌ای، گردنده 2 غیرمستقیم 3 مبتنی بر دور *n* اطلاعیه

**circular current** *noun*
(کارەبا) تەزووی بازنەیی ۞ جریان دایره‌ای

**circular file** = (facetious) wastebasket

**circularity** /,sɜ:kjə'lærəti, US ,sɜ:rk-/ *noun*
1 سوور یان دەوری پووچەڵ 2 بازنەیی، خڕی، خڕێتی، خڕۆکی، خەپکەیی، چەمەری ۞ 1 دور باطل 2 دایره‌واری

**circularization** *noun*
1 دەرکردنی ئاگادار یان ڕاگەیاندن‌نامە 2 خڕاندن، خڕکردن، خڕەڵدان (circularizer *n*) ۞ 1 صدور اطلاعیه 2 گردسازی

**circular-latter** *noun*
نامەی گشتی ۞ نامه‌ی همگانی

**circular motion** *noun*
بزووتن یان جووڵەی سووڕی، گەڕ، گل ۞ حرکت دورانی

**circular saw** *noun*
خڕەمشار، مشاریا هەڕەی خڕ؛ هەرووەها تیغەکەی بەخۆی ۞ اره‌ی گردی

**circulating** *adjective*
گەڕۆک ۞ متحرک

**circulating decimal** = repeating decimal

**circulating library** *noun*
(مێژوویی) کتێبخانەی پێ‌سپاردنەوە یان لەگەڕدا (کتێبەکانی بە کرێ دەدا) ۞ کتاب‌خانه‌ی در گردش

**circulating medium** *noun*
هۆی یان کەرەسەی بەبرەو (ب.ت. کۆین یان زێڕ) ۞ وسیله‌ی رایج

**circulation** /,sɜ:kjə'leɪʃn, US ,sɜ:rk-/ *noun*
1 ڕەوت، لێشاو، تەوژم 2 سووڕان، گەڕان، زڤڕین 3 سووڕ، سووڕان یان گەڕانی خوێن 4 بڵاوبوونەوە، تەشەنە 5 بڵاوک، تیراژ (ڕۆژنامە و کۆڤار) 6 چوون، بڕەوی، پارە، پوول (circulator *n*: بڵاوکەرەوە؛ circulatory /,sɜ:kjə'leɪtəri, US 'sɜ:rkjələtɔ:ri/ *adj*: سەربە سووڕانی خوێن) ۞ 1 جریان 2 گردش 3 جریان خون 4 انتشار، اشاعه 5 تیراژ 6 رواج، پول

**circulatory system** *noun*
(کارئەندامناسی) دەزگای سوورۆک یا سووڕان: دەزگای خوێن، ڕەگە خوێنی‌یەکان و بۆری لەشاوی lymphatic و دڵ ۞ سازگان گردشی

**circum-** /'sɜ:kəm/ *prefix*
پێشگر: دەوروبەر، دەوراندەور، دەوروپشت، دەور، بازنە، دەورە: *circumambulate*، *circumpolar* (بنەڕەت: لە لاتینەوە *circum* "round") ۞ پیشوند: پیرامون، دور، دایره

**circumambient** /,sɜ:kəm'æmbɪənt/ *adjective*
دەوردەر، دەورگر، ئالقەدار، چواردەوراگر، encompassing (circumambiency or -ience *n*: دەوردان، دەورگرتن، چواردەوردەوردان، ئالقەدان، دەورگری؛ -ently /,sɜ:kəm'æmbɪəntli/ *adv*) ۞ احاطه‌کننده

**circumambulation** /,sɜ:kəm,æmbjə'leɪʃən/ *noun*
بەدەورداگەڕان، گەڕان، خولانەوە (بە دەور شتێ، circumambulator *n*؛ circumambulatory

adj) ۞ طواف

**circumcision** /ˌsɜːkəmˈsɪʒn, US ˌsɜːrk-/ *noun*
1 سونەت، خەتەنە (کوڕ یا کچ، ب.ت. لە نێو جوو و موسوڵمانەکاندا) 2 (Circumcision) خەتەنەسووڕانی (یا خەتەنەبڕانی) مەسیح، یەکی ژەنیویری (بنەڕەت: لە *circonciser* فەرەنسی کۆن، یان لە *-circumcis* ،*circumcidere* "بڕین") ۞ 1 ختنه 2 سرکومسیون

**circumference** /səˈkʌmfərəns, US sərˈk-/ *noun*
1 کەوە، کەمە (بازنە)، کەمەرە، چێوەی بازنە، دەوری بازنە یان جەغز، چەنبەرەی بازنە: *the circumference of the earth* 2 چەمەرە، قەف، دەور 3 درێژایی کەمە یان چێوەی بازنە ۞ 1 محیط دایره 2 دور 3 سرکمفرنس

**circumferential** /sɜːkʌmfəˈrenʃel/ *adjective*
دەوردەر، دەورگر ۞ احاطەکنندە

**circumflex** /ˈsɜːkəmfleks, US ˈsɜːrk-/ *noun, adjective*
*n* سێرکامفلێکس، چوکڵە (نیشانەیێ «^» کە لەسەر بزوێنی هێندێ زمان (وەکوو فەرەنسە) دادەنرێ تا پیشان بدا کە چۆن ئەو وشەیە گۆ بکرێ) *adj* چەماوە، لار، چەم ۞ *n* سیرکُن‌فلکس *adj* خمیده، خم

**circumflex accent** = circumflex

**circumfluent** /sɜːˈkʌmfluənt/ *adjective*
دەورگر، دەورلێدەرەوە ۞ احاطەکنندە

**circumfluous** *adjective*
1 دەورگر 2 دەورگیراو بە ئاو، ئاوگیر ۞ 1 احاطەکنندە 2 محصور توسط آب

**circumfusion** /ˌsəkəmˈfjuːʒən/ *noun*
دەوردان، دەورگرتن ۞ احاطە

**circumgyration** /ˌsɜːkəmdʒaɪˈreɪʃn/ *noun*
دەورلێدان، چەرخان، سووڕان، گەڕان ۞ گردش

**circumlocution** /ˌsɜːkəmləˈkjuːʃn, US ˌsɜːrk-/ *noun*
درێژدادری، درێژدڕی ۞ اطناب

**circumlocutory** /ˌsɜːkəmˈlɒkjʊtəri, ˌsɜːkəmləˈkjuːtəri, US ˌsɜːrkəmˈlɑːkjətɔːri/ *adjective*
درێژدادریانە ۞ وابستە بە اطناب

**circumlunar** *adjective*
دەخولێتەوە یان جێگیرە لە دەوری مانگدا، دەورەمانگی ۞ سرکم‌لونار

**circumnavigation** /ˌsɜːkəmˌnævɪˈɡeɪʃn, US ˌsɜːrk-/ *noun*
دەورلێدان (ب.ت. دەوری دنیا) بە کەشتی ۞ جهان‌گردی با کشتی

**circumpolar** /səːkəmˈpəʊlə/ *adjective*
دەورجەمسەری، دەورەجەمسەری، سێرکەمجەمسەری ۞ حول قطبی

**circumscribed** *adjective*
بەرتەسککراو، سنووربۆدانراو ۞ محدودشده

**circumscription** /ˌsɜːkəmˈskrɪpʃn, US ˌsɜːrk-/ *noun*
بەرتەسک کردنەوە، سنووردارکردن، دەورگرتن، بەستنەوە، دیاریکردن، دەس‌نیشان‌کردن ۞ محدودسازی، تحدید، محاط‌سازی

**circumsolar** /ˌsɜːkəmˈsəʊlə(r)/ *noun*
دەورەخۆری، سێرکەمخۆری ۞ حول شمسی

**circumspect** /sɜːkəmˈspekt/ *adjective*
ئاگادار، هۆشیار، وریا، دووربین، تۆکمەکار، cautious ،prudent: *diplomacy required a circumspect response* ◊ *The banks should have been more circumspect in their dealings* ۞ محتاط، دوراندیش

**circumspection** /ˌsɜːkəmˈspekʃn, US ˌsɜːrk-/ *noun*
ئاگاداری، هۆشیاری، وریایی، دووربینی، قایمکاری ۞ احتیاط، حزم

**circumspective** /ˈsəkəmspektɪv/ *adjective*
ئاگادار، هۆشیار، وریا، تۆکمەکار ۞ محتاط

**circumspectly** /ˈsəkəmspektɪvli/ *adverb*
ئاگادارانە، لە رووی وشیاری یان هۆشیارییەوە، لە رووی پارێزەوە، بە دووربینییەوە: *I would suggest that for the time being you behave as circumspectly as possible in political matters* ۞ از روی احتیاط

**circumstanced** *adverb*
لە رەوشێکی دیاریکراودا ۞ در وضعیت معین

**circumstances** *noun, pl.*
1 بارودۆخ، رەوش، هەڵومەرج، بار، چۆنیەتی 2 بوویەر، رووداو 3 باری ماڵی، ژیوار ۞ 1 شرایط، اوضاع، موقعیت 2 حادثه 3 وضع مالی

**circumstantial** /ˌsɜːkəmˈstænʃl, US ˌsɜːrk-/ *adjective*
1 تێروتەسەل، چڕوپڕ، ورد، پڕ لە وردەکاری، دووروودرێژ (ئاماژە بە شتێ کە راستە بەڵام نایسەلمێنێ)، particular ،detailed: *The case against him was largely circumstantial* ◊ *a circumstantial account* ◊ *a circumstantial account of the fight* 2 (فەرمی) پێوەندی هەیە یان سەربە یان دەکەوێتە سەر بارودۆخ یان بارێکی تایبەتی، بەندە بە رەوش یان هەڵومەرجێکەوە: *Their problems were circumstantial rather than personal* ◊ *a circumstantial case* ◊ *circumstantial factors* ◊ *a circumstantial result* 3 لاوەکی، باگرنگ، رێکەوتی، پێوەندی‌دار بەڵام نە بنەڕەتی، 4 secondary ،unessential ،incidental

سەربە هەلومەرجی بەختەوەری یان ئاسوودەیی مادی ⟡ ceremonial – 5 material welfare
1 مفصل، مشروح، با ذکر جزئیات 2 وابسته بە یا مربوط بە شرایط 3 ضمنی، جانبی، ثانوی، فرعی 4 وابسته بە سعادت یا بهزیستی مادی

**circumstantial evidence** *noun*
بەلگە و نیشانەکان ⟡ قرائن و امارات

**circumstantiality** /ˌsɜːkəmˈstænʃɪˈælɪtɪ/ *noun*
تیروتەسەلی، چروپری، پەروردەکاریتی، دووورودرێژی ⟡ تفصیل

**circumstantially** /ˌsɜːkəmˈstænʃli, US ˌsɜːrk-/ *adverb*
بە چروپری، بە تیروتەسەلی، بە وردی ⟡ بە تفصیل، بە طور مشروح

**circumterrestrial** *adjective*
دەخولێتەوە یا جێگیرە لە دەوری زەوی‌دا، دەورەزەمینی ⟡ حول زمینی

**circumvallation** *noun*
سەنگەرلێدان، دەوردان بە شوورە یان دیوار، دیوارکردن، شوورەدانان، چەپەرلێدان (بنەڕەت. لە *circumvallat-* ،*circumvallare* لاتین "دەوردان بە شوورە rampart") ⟡ سنگربندی

**circumvention** /ˌsɜːkəmˈvenʃn, US ˌsɜːrk-/ *noun*
خۆدزینەوە، هەلاتن، دەرچوون، فێڵی شەرعی، دەمشیرینی، چارەدۆزینەوە، ڕێگادۆزینەوە، فریودان، تەفرەدان، لەخشتەبردن، هەڵفریواندن ⟡ گریز، کلاه شرعی، فریب

**circumvolution** /ˌsɜːkəmvəˈluːʃ(ə)n/ *noun*
1 خول 2 دەورلێدان، پێچدان، پێچ‌خواردن، (وەر)چەرخان، گەران، سووران 3 لاڵێدانەوە، ئاوڕ ⟡ 1 دوره 2 دورزنی 3 التفات

**circus** /ˈsɜːkəs, US ˈsɜːrkəs/ *noun, adjective*
*n* 1 سیرک، جامبازخانە 2 مەیدان، گۆڕەپان *adj* بەجۆش‌وخرۆش، خۆش، شاد، پردەنگ‌وهەرا ⟡ *n* 1 سیرک 2 عرصە *adj* پرهیجان

**cirque** /sɜːk, US sɜːrk/ *noun*
1 سیرک 2 خەبکە، چەمەرە، ئاڵقە، بازنە، circle، ring 3 مەیدان (شوێنی پێک‌گەیشتنەوەی شەقامەکان) 4 (زەوی‌ناسی) چالان؟: بۆشایی، بەنگاو یان گۆلکاویکی کاسەئاسای تەلانێ (یان قەدپالی mountainside) کە بەهۆی کاری glaciation پێکهاتووە ⟡ 1 سیرک 2 حلقه، دایره 3 میدان 4 سیرک

**cirrhosis** /səˈrəʊsɪs, US -ˈroʊ-/ *noun*
(بە) ڕیشاڵبوونی جگەری، جەرگە ڕیشاڵبوون (cirrhotic /sɪˈrɒtɪk/ *adj*: توشبوو بە ڕیشاڵبوونی جگەر) ⟡ تشمع کبدی

**cirriped** /ˌsɪrɪˈpiːdɪə/ *noun*, also cirripede
گیانەوەری پێ‌لوول، پالوول (barnacle ـەکان دەگرێتەوە) ⟡ سیرپید

**Cirripedia** *noun, pl.*
(گیانەوەرناسی) پێ‌لوولەکان، پالوولەکان ⟡ سیرپیدیا

**cirrocumulus** /ˌsɪrəʊˈkjuːmjələs, US ˌsɪroʊ-/ *noun*
هەوری سیروکۆمۆلۆس ⟡ سیروکومولوس

**cirrostratus** /ˌsɪrəʊˈstrɑːtəs, -ˈstreɪtəs, US ˈsɪroʊ-/ *noun*
هەوری سیرۆستراتوس: هەورێکی تاریک‌تر لە cirrus کە توێ یان چینێکی نیوەڕوون -semi translucent، تەنک و ناڕێک لە بەرزاییێکی زۆردا پێکدێنێ و زۆربەی ئاسمان دادەپۆشێ ⟡ سیروستراتوس

**cirrus** /ˈsɪrəs/ *noun, pl.* cirri /-rʌɪ/
1 پەلکەهەور، هەوری سیروس 2 (ڕووەک‌ناسی) تەرز tendril 3 (گیانەوەرناسی) تەرزێکی باریک یان تاڵێکی مووناسا، ب.ت. پاشکۆی barnacle یان هەودای ماسی‌یێ ⟡ سیروس

**CIS** /ˌsiː aɪ ˈes/ *abbreviation*
Commonwealth of Independent States
سی‌ئای‌ئێس (= کۆمەڵەی ولاتانی سەربەخۆی هاوبەرژەوەند) ⟡ جامعەی کشورهای مستقل مشترک‌المنافع، سی‌آی‌اس

**cis-** *prefix*
پێشگر: 1 لەم‌لایە، لەم‌بەرەی، لەم‌بەر: *cislunar* 2 لە لای نزیک‌تری ڕۆم: *cisalpine* 3 نزیک‌تر بە ئێستا: *cis-Elizabethan* 4 (زۆرتر لار (تیتالیک) -*cis*) بۆ ناوی ئاوێتە کیمیایی‌یەکان بەکاردێنرێ کە کۆمەڵە ئیزۆمێریکی ئەندازەیی هەیە، دوو گەردیلە یان کۆمەڵی وەک‌یەکی هەیە کە بەسەر هەمان لای گەردیکەوە نووساوە کە بەهۆی ئاستێکی تایبەتی هاوتایی(یەوە) دابەش بووە: *cis-1,2-dichloroethene* (لە *cis* لاتین) ⟡ پیشوند: 1 در این سو، این سویه 2 و 3 نزدیک‌تر (زمان یا مکان) 4 سیس

**cisalpine** /sɪsˈalpʌɪn/ *adjective*
لە لای باشوور یان خوارووی چیاکانی ئالپ ⟡ سیسالپین

**cisatlantic** /sɪsətˈlantɪk/ *adjective*
لەم لای ئەتلانتیکەوە (وەک لا نزیک‌ترەکەی) ⟡ سیساتلانتیک

**cisco** /ˈsɪskəʊ/ *noun, pl.* ciscoes
جۆرێ ماسی (هی ئاوە شیرینەکانی باکوور، گرنگە لەبەر گۆشتەکەی [توخم *Coregonus*، چەندین جۆرن]) ⟡ سیسکو

**cislunar** /sɪsˈluːnə/ *adjective*
(هەڵکەوتوو لە) نێوان زەوی و مانگ(دا) ⟡ واقع میان زمین و ماه

**cisplatin** /sɪs'platɪn/ *noun*
(پزشکی) ئاوێتەیێکی پلاتینیۆمی $C_{12}H_6N_2Pt$ کە لە کیمۆتراپی chemotherapy شێرپەنجەدا بەکاردێتریێ ◌ سیس‌پلاتین

**cispontine** /sɪs'pɒntʌɪn/ *adjective*
(کۆن) لە لای باکوور(ی) یان سەرووی پردەکانی تەیمز Thames لە لەندەنەوە (بنەڕەت: لە -cis + *pons*، *pont-* لاتین "پرد") ◌ سیس‌پونتین

**cissy** = sissy

**cist**[1] /sɪst/ *noun*, also kist
سنووق (لە داری هولۆل یان بەرد؛ بنەڕەت: ویلزی "chest") ◌ صندوقچە

**cist**[2] /sɪst/ *noun*
(لە یۆنانی کۆندا) سنووق (بۆ شتە پیرۆزەکان، لە *cista* لاتین، لە *kistē* یۆنانی "box") ◌ صندوقچە

**Cistercian** /sɪ'stəːʃ(ə)n/ *noun, adjective*
*n* ڕەبەن (ج ژن، ج پیاو)ی بێنەدیکتینی *adj* سەربەو تیرەیە (بنەڕەت: لە ناوی *Cîteaux*، نزیک بە Dijon لە فەڕەنسە، جێگایێ کە ئەو تیرەیە دامەزرا) ◌ *n* راهب یا راهبەی بندیکتینی *adj* وابستە بە این فرقە

**cistern** /'sɪstən, US -tərn/ *noun*
1 حەوز، عەماری ناو، عەمباراو، ئەستێرک، ئەنباراو، ئاودان، تانکی ئاو 2 سنووقە: توورەکە یان کیسە یان بۆشایییێکی شلەدانی زیندەوەرێ (لە *cisterna* لاتین، لە *cista* (بڕوانە cist [2]) ◌ 1 مخزن آب 2 سیسترن

**cisterna** *noun, pl.* cisternae
1 2 cistern 2 ئەستێرکە: یەکێ لە شوێنە گەورەکانی ژێر arachnoid membrane؛ یەکێ لە توورەکە vesicle پانەکانی تۆڕی ئێندۆپلازمی endoplasmic reticulum یان دەزگای گۆلژی Golgi apparatus کە یەکەی بنەڕەتی ئەو ئەندامزەیانەیە (cisternal *adj*) ◌ سیسترنا

**cistron** /'sɪstrɒn/ *noun*, also structural gene
کەرتێکی گەردی DNA یا RNA کە پێکهاتەی زنجیرەیێکی پۆلی‌پێپتایدی (لە پێکهێنانی پرۆتێین) دیاری دەکا (cistronic *adj*) ◌ سیسترون

**cistus** /'sɪstəs/ *noun*
دەوەنێ بە گوڵی سوور و سپی‌یەوە [تۆخم *Cistus*] ◌ سیستوس

**citadel** /'sɪtəd(ə)l, US -dɛl/ *noun*
1 قەڵا، دژ 2 (خوازە) سەنگەر، مەتەرێز، پارێزەر 3 هاڵ یان سالۆنی کۆبوونەوەی سپای رزگاری (بنەڕەت: لە *citadelle* فەڕەنسی یان لە *cittadella* ئیتالیایی، لەسەر بنچینەی *civitas* لاتین (بڕوانە شار city) ◌ 1 ارگ، دژ 2 (مجازی) سنگر 3 سیتادل

**citation** /saɪ'teɪʃn/ *noun*
1 گێڕانەوە، باس کردن، وەرگرتن 2 نامەی بانگ کردن، بانگ‌نامە، ئامادەنامە 3 بانگ کردن 4 دانەپاڵ، خستنەپاڵ 5 ڕێزلێنان، پێزانین ◌ 1 نقل قول، ذکر 2 احضاریە 3 احضار 4 استناد 5 تقدیر

**cithara** *noun*, also kithara
قیسارە: ئامێرێکی موسیقای یۆنانی کۆنە ◌ قیثارە

**citied** *adjective*
1 هەڵکەوتوو لە شاردا 2 شارئاسا ◌ 1 واقع‌شدە در شهر 2 شهرمانند

**citified** /'sɪtɪfaɪd/ *adjective*, also cytified
(زۆرتر لە ڕووی سووکی‌یەوە) شاری، بەشاری‌بوو ◌ شهری‌شدە

**citizen** /'sɪtɪzn/ *noun*. also civilian
هاووڵاتی، هاونیشتمانی، شارمەند، شارستانی، باژێروانی، شاری ◌ تبعە، شهروند

**citizenry** /'sɪtɪzənri/ *noun, pl.* citizenries
هاووڵاتی‌یان، هاونیشتمانان، شارمەندەکان، دانیشتووان، شاری‌یەکان، شارستانی‌یەکان ◌ شهروندان، سکنە، اهالی

**Citizen's Advice Bureau** *noun*, *abbreviation* CAB
بەڕێوەبەرایەتی ڕاوێژکاری خۆڕایی (بریتانیا) ◌ ادارەی مشاورەی رایگان

**Citizen's Band** = CB

**citizenship** /'sɪtɪzənʃɪp/ *noun*
هاووڵاتێتی، هاونیشتمانێتی، شارمەندی ◌ تابعیت، شهروندی

**citole** /sɪ'təʊl/ *noun*
ئامێرێکی ژێداری عوودئاسای medieval، پێشەنگی cittern ◌ سیتول

**citr- (also citri- or citro-)** *prefix*
پێشگر: 1 ترشەمەنی: *citriculture* 2 ترشەلۆکی سیتریک: *citrate* ◌ پیشوند: 1 مرکبات 2 اسید سیتریک

**citral** /'sɪtral/ *noun*
(کیمیا) سیترال: شلەیێکی بۆن‌خۆش $C_{10}H_{16}O$، لە ترشەمەنی و ڕۆنی سەوزی لیمۆترش‌دا هەیە و لە گوڵاوسازی‌دا بەکاردێتریێ ◌ سیترال

**citrate** *noun*
خوێ یا ئێستێری ترشەلۆکی سیتریک ◌ سیترات

**citric** /'sɪtrɪk/ *adjective*
سیتریک، بەرهەم‌هاتوو یان پێوەند و سەربە citrus fruit ◌ سیتریک

**citric acid** /ˌsɪtrɪk 'æsɪd/ *noun*
(کیمیا) ترشەلۆکی سیتریک $C_6H_8O_7$ ◌ جوهر لیمو

**citric acid cycle** *noun*
سووڕی ترشەلۆکی سیتریک ◌ چرخەی اسید سیتریک

**citriculture** *noun*
کردنی (دار و درەختی) ترشەمەنی وەک لیمۆ،

**clime(s)** /klaɪm/ *noun, pl.*
ئاو و هەوا، مەڵبەند، ئاقار، کیشوەر، وڵات (بە ئاو و هەوای خۆیەوە): *I'm heading for sunnier climes next month* ◌ آب و هوا، اقلیم، سرزمین

**clin(o)-** *prefix*
پێشگر: لاری، لێژی، خواری ◌ پیشوند: شیب

**-clinar** *suffix*
پاشگر: لێژ، لار، خێس، خوار ◌ پسوند: شیب‌دار

**clinch** /klɪntʃ/ *noun*
1 بزماری پەرچ 2 گیرە، بەست 3 باوەش، ئامێز، حمێز 4 دەست لێ‌هەڵپێکان (لە شەڕەمشتدا) ◌ 1 میخ پرچ 2 گیره 3 بغل 4 کلینچ

**clincher** /ˈklɪntʃə(r)/ *noun*
1 پەرچ‌دەری بزمار 2 گیرە، قولاپ 3 قسەی ئاخر، دواقسە، وتەی کۆتایی 4 بەڵگەی یەکلاییکەرەوە یان بڕینەرەوە، خاڵی کۆتایی ◌ 1 کلینچر 2 گیره 3 ختم مقال 4 دلیل قاطع

**cline** /klaɪn/ *noun*
کلاین، کانتیوم، لێژە، زنجیرەک، زنجیرەجیاوازی (*adj* clinal: لێژەیی، سەربە زنجیرەجیاوازی؛ *adv* clinally) ◌ پیوستار

**cling** /klɪŋ/ *noun*
1 کوخی clingstone 2 دەنگی زرینگە ◌ 1 نوعی هلو 2 صدای جرنگ

**cling film** *noun*
پلاستیکی نایلۆنی خۆراک پێچانەوە، بەرگەخۆراک ◌ فویل نایلونی

**clingfish** *noun, pl.* same or clingfishes
ماسی‌یەمژە، ماسی‌یەچەسپە (ئەندامێکی مژینی هەیە بۆ نووسان بە بەرد یان شتێکی ترەوە [*Lepadogaster lepadogaster* و جۆرەکانی تر]) ◌ نوعی ماهی

**clinging** /ˈklɪŋɪŋ/ *adjective*, also clingy /ˈklɪŋi/
1 چەسپیو، تەنگ(وتومان) 2 پشت‌پێ‌بەستوو، لێوەنەبوو، بەند، پاشکۆ، پێوەبەند: *a clinging child* ◌ 1 چسبان 2 وابسته

**clingstone** *noun*
جۆرێ کوخ کە گۆشتەکەی بە دەنکەکەیەوە نووساوە (بڕوانە freestone) ◌ نوعی هلو

**-clinic** *suffix*
پاشگر: 1 لێژ، سەرەوخواری؛ قوول: *isoclinal* 2 خاوەنی چەندین بەش یا تەوەری لار یا خوار یان لابەلا: *monoclinic ،triclinic* ◌ پسوند: 1 شیب‌دار، سرازیر 2 دارای چند قسمت یا محور مایل

**clinic** /ˈklɪnɪk/ *noun*
1 نەخۆش‌خانەی تایبەتی، کلینیک 2 پزشک یان نۆژدار یان نۆژدارانی کلینیک 3 وەختی کاری کلینیک 4 فێرکاری کلینیک 5 (ئەمریکا) کۆنفرانسی لەسەر بابەتێکی تایبەتی 6 دادگای خۆرایی یان بەلاشی نەخۆش‌خانە ◌ 1 درمانگاه 2 پزشک یا پزشکان بالینی 3 وقت کار کلینیک 4 آموزش طب بالینی 5 و 6 کلینیک

**clinical** /ˈklɪnɪkl/ *adjective*
1 سەرجێیی، کلینیکاڵ 2 سەربە نەخۆش‌خانەی تایبەتی 3 ناهاوسۆز، نادڵسۆز، ناخەمخۆر، لەسەرەخۆ، هێمن، ئارام: *He watched her suffering with clinical detachment* 4 سادە، نەرازاوە ◌ 1 بالینی 2 درمانگاهی 3 فاقد احساس هم‌دردی، خونسرد، سرد 4 بی‌پیرایه

**clinically** /-kli/ *adverb*
1 بە شێوەیەکی کلینیکاڵ 2 بە شێوەیەکی لەسەرەخۆ، هێمنانە ◌ 1 به طور بالینی، به لحاظ بالینی 2 با خونسردی

**clinical psychologist** *noun*
دەروونناسی کلینیکاڵ ◌ روان‌شناس بالینی

**clinical psychology** *noun*
دەروونناسیی کلینیکاڵ ◌ روان‌شناسی بالینی

**clinical thermometer** *noun*
ئەندازە(ک)، پلەک، ئامێرێ بۆ پێوان یان ئەندازەگرتنی پلەی گەرمی لەش، گەرمی‌پێوی لەش ◌ درجه

**clinician** /klɪˈnɪʃn/ *noun*
نۆژدار یان پزشکی کلینیک: پزشکێ کە راستەوخۆ پێوەندی لەگەڵ نەخۆشەکەوە هەیە و بەرپرسی تیمارییەتی، تا ئەوەی کە بە شێوەی تیۆری یان توێژینگەیی کار بکا ◌ پزشک بالینی

**clink**[1] /klɪŋk/ *noun*
(دەنگ) خرنگەخرنگ، خرنگ‌وهۆڕ، خرینگە، زرەزڕ، زروهۆڕ، زرنگەزرنگ، زرنگ‌وهۆڕ، شەقەشەق ◌ (صدا) جیرینگ‌جیرینگ

**clink**[2] /klɪŋk/ *noun*
(نافەرمی) بەندی‌خانە، کون ◌ هلفدونی

**clinker**[1] /ˈklɪŋkə(r)/ *noun*
1 سەرکوزەر، چەتی کانزا، سەرکوزەر یان چەتی کوورە، تڵتەکانزا، خڵتەکانزا 2 خشتی کاشی 3 بزرینگێوە، خرنگەلێوەهاتوو، زرینگن، زرنگۆک، خرینگن، زرنگەلێوەهاتوو 4 (clinkers) زنجیر، بەند، بەست ◌ 1 فساله 2 آجر لعابی 3 جیرینگ‌کننده 4 (در جمع) بند

**clinker**[2] /ˈklɪŋkə(r)/ *noun*
نۆتی هەڵەی موسیقا ◌ نت اشتباهی موسیقی

**clinker-built** *adjective*
(لەمەڕ کەشتی‌یێ) دروست‌کراو لە کۆمەڵە تەختە یان تەڵشێ کە لێوارەکانی دەرەوەیان تێک پەڕیون (یان بە شێوەی نێر و مێ لەسەر یەک پەرچ کراون)، خاوەنی لاشەیێ کە قاوخەکەی لە کۆمەڵێ strake ی پێک‌داچوو یان تێک‌پەڕیو پێکهاتووە ◌ کلینکربلت

**clinometer** /klaɪˈnɒmɪtə(r), US klɪ-/ *noun*
لێژی‌پێو ◌ شیب‌سنج

**clinometric** *adjective*, also clinometrical
سەربە لێژیپێو ◇ وابسته به شیب‌سنج
**clinometry** *noun*
لێژیپێوی ◇ شیب‌سنجی
**-clinous** *suffix*
پاشگر: خاوەنی androecium یا gynoecium لە گوڵ (یەکی تاک یان جیاواز) یان (دوو گوڵی جیاواز) گوڵەکاندا، خاوەنی نێرەک یان نێرک لە گوڵێک یان دوو گوڵدا: *diclinous* (بنەڕەت: ڕەنگە لە *clinus*- لاتینی نوێ، لە *klinē* یۆنانییەوە "bed") ◇ پسوند: کلینوس
**clinquant** /ˈklɪŋkənt/ *adjective, noun*
*adj* پڕزریقەوبریقە *n* پوولەکە، پوولەک ◇ *adj* دارای زرق‌وبرق *n* پولک
**clintonia** *noun, pl.* clintonias
(ڕووەکناسی) هەر گیا و ڕووەکێکی خێزانی lily بە گوڵی سپی و زەردەوە (لەسەر لاسکێکی کورت [توخم *Clintonia*]؛ بنەڕەت: لاتینی نوێ، ناوی توخم، لە *Clinton* DeWitt وەرگیراوە) ◇ نوعی گیاه
**Clio** *noun*
1 کلیۆ: Museی یۆنانی بۆ مێژوو، خواژنی مێژوو 2 مێژوو لای یۆنانییەکان 3 پەیکەرۆکەی خەڵاتی ساڵانە لە لایەن ڕێکخراوەیێکی پیشەییەوە بۆ کارێکی گرنگ لە بواری چاپ یان بانگەشە ◇ کلیو
**cliometric** *adjective*
مێژووپێوییانە، سەربە مێژووپێوی ◇ وابسته به تاریخ‌سنجی
**cliometrician** *noun*
مێژووپێو ◇ تاریخ‌سنج
**cliometrics** /ˌklʌɪə(ʊ)ˈmɛtrɪks/ *noun, pl.*
مێژووپێوی: لێکۆڵینەوەی زانیارییە مێژووییەکان بەهۆی بەکارهێنانی شێواز و تەکنیکە سەرژمێرییەکان statistical ◇ تاریخ‌سنجی
**clip¹** /klɪp/ *noun*
1 گیرە، گیرگە، بەست: *toe clips* ◊ *a hair clip* 2 دەرزی، گوڵی سەرسنگ *on a bicycle* 3 خەشاب ◇ 1 گیره 2 سنجاق سینه 3 خشاب
**clip²** /klɪp/ *noun*
1 بڕینەوە، هەڵپاچین، بەڕتاوتن، کورتکردنەوە 2 بەربڕینگ (ئەو بڕە خورییەی کە بە جارێ بڕدراوەتەوە) 3 زللە، شەپلاخە 4 مشت 5 تیکە، بڕشت، بڕگە (فیلم) 6 هەنگاو یا جوولەی توند و خێرا، ڕاتڵەکان ◇ 1 چیدن، بریدن 2 کلیپ 3 سیلی 4 مشت 5 تکه (فیلم) 6 گام یا حرکت سریع
**clip art** *noun*
کلیپ ئارت ◇ کلیپ آرت
**clipboard** /ˈklɪpbɔːd, US -bɔːrd/ *noun*
تەختی گیرەدار، تەختەی لەسەرکێشانەوە ◇ تخته‌شاسی
**clip clop** /ˈklɪp klɒp, US klɑːp/ *noun*
زرمەوکوت، زرمەوهۆڕ، خرمەخرم (دەنگی پێی ئەسپ) ◇ کلیپ کلوپ
**clip joint** *noun*
تالانگە (خواردنگە، یانەی شەوانە و هتد) ◇ سرگردنه
**clip-on** *adjective*
گیرگەدار، گیرەدار ◇ گیره‌دار
**clipped** /klɪpt/ *adjective*
1 خاوێن، داهێناو (قژ) 2 ڕوون، ڕۆشن، بڕا، دیار: *his clipped military tones* ◇ 1 آراسته (مو) 2 واضح، شمرده، قاطع
**clipped form** *noun*
(زمانەوانی) وشە یان شێوگی کورتەوەکراو ◇ صورت کوتاه‌شده
**clipped word** *noun*
(زمانەوانی) وشەی کورتەوەکراو یا قەڵتێنراو ◇ واژه‌ی کوتاه‌شده
**clipper** /ˈklɪpə(r)/ *noun*
کەشتی چارۆکەداری خێرا ◇ کلیپر
**clippers** *noun, pl.*
1 نینۆکبڕ، نینۆکگیر 2 دەزگا یان ماشێنی سەرکورتکردنەوە، ماشێنی سەر 3 مقەستی هەڵپاچین 4 بڕینگ ◇ 1 ناخن‌گیر 2 ماشین اصلاح 3 قیچی باغبانی 4 قیچی پشم‌زنی
**clippie** *noun, pl.* clippies
دواشۆفێر یان شاگردی پاس ◇ کمک‌راننده‌ی اتوبوس
**clipping** /ˈklɪpɪŋ/ *noun*
1 بڕشت 2 (زمانەوانی) کورتکردنەوە، قەڵتاندن ◇ 1 بریده 2 اختصار
**clique** /kliːk/ *noun*
دارودەستە، دەستە ◇ باند
**cliquey** /ˈkliːki/ *adjective* (cliquier, cliquiest), also cliquish /ˈkliːkɪʃ/
سەربە دەستەیێکی تایبەتی، لەژێر کۆنترۆڵی دارودەستەدا، دارودەستەسازکەر ◇ تحت کنترل باند، متمایل به باندبازی
**clitic** /ˈklɪtɪk/ *noun*
(ڕێزمان) کلیتیک، وشەبەند (= وشەیەکی بێ‌زەبر کە زۆرتر لە لێکدانا لەگەڵ وشەیەکی تر دەردەکەوێ، وەکوو *'m* لە *I 'm* دا؛ بنەڕەت: لە *(pro)clitic* و *(en)clitic*) ◇ کلیتیک، واژه‌بست
**cliticization** /ˌklɪtɪkʌɪˈzeɪʃ(ə)n/ *noun*
کلیتیزاسیۆن، کلیتیکاندن، کلیتیزەیشن ◇ کلیتیزاسیون
**clitoral** /ˈklɪtərəl/ *adjective*, also clitoric
مێتکەیی، بەلۆکەیی، قیتکەیی ◇ بظری، چوچوله‌ای
**clitoridectomy** /ˌklɪt(ə)rɪˈdɛktəmi/ *noun, pl.* clitoridectomies

خەتەنـەی ژن؛ بـڕینی میتکـە، میتکەبـڕی ◌ کلیتوریدکتومی
**clitoris** /ˈklɪtərɪs/ *noun*
میتکـە، بەلۆکـە، قیتکـە، چیلـک، نێـوەر، چیچـک، زیلـک، گلـک، نیچـک، قیچـک (بنـەڕەت: لـە *kleitoris* یۆنانییەوە) ◌ بظر، چوچوله، خروسه
**clitorism** *noun*
پانپانۆکێ، پانپانۆکە، قوزەتەقێنە، قاش ◌ مساحقه
**clitoridtis** *noun*
میتکەئاوسـان یـا ئاوسـێ، هـەوکردنی میتکـە، میتکەسوێ ◌ ورم کلیتوریس
**clivia** /ˈklʌɪvɪə/ *noun*
گیـایێکی ئـەمریکای باشـووری لـە تـیرەی lily [توخم *Clivia*] (لە نـاوی خـانم Charlotte *Clive*، دوشێسـی Northumberland) ◌ کلیویا
**Cllr** *abbreviation* Councillor
ڕاوێژکار، ڕاوێژگەر ◌ مشاور
**cloaca** /kləʊˈeɪkə/ *noun, pl.* cloacae /-siː, -kiː/
1 (گیانەوەرناسـی) ژێرابـە 2 (کـۆن) زێـراب، ئـاوەڕۆ، پیـساوڕۆ (بنـەڕەت: لـە لاتـین "sewer"، "drain"؛ *adj* cloacal) ◌ 1 کلویکـا، کلـوآک 2 مجرای فاضلاب
**cloak** /kləʊk, US kloʊk/ *noun*
1 جبە، عەبا، باڵاپۆش، بەتە (سووک)، کۆلوانە، چارۆکـە، تەرگـە 2 سـەربەرگ، بـەرگ، پۆشـە، پەردە، داپۆشـە، دەمامـک، پۆشـشت: *They left under the cloak of darkness* ◌ 1 شنل، عبا، ردا 2 لفافه، پوشش
**cloak-and-dagger** *adjective*
نهێنێ، پەنامەکێ، لەبنەوە، دزەکێ، ڕازاوێ: *a cloak-and-dagger novel* ◌ سری، مرموز
**cloakroom** /ˈkləʊkruːm, -rʊm, US ˈkloʊk-/ *noun*
1 دەسبـەئاو، دەسـتاوخانە، ئـاودەسـتخانـە 2 ژووری خۆگۆڕین ◌ 1 توالت 2 رختکن
**clobber** /ˈklɒbə(r), US ˈklɑːb-/ *noun*
کـەلوپـەل، شـتومـەک، شـرەوبرە، شرەوشـاتاڵ، شمەک، جلوبەرگ ◌ وسایل، خرت و پرت، لباس
**cloche** /klɒʃ, US kloʊʃ/ *noun*
1 پارێزەی شووشـەیی (گیا، بۆ پاراسـتنی تـوو یـان دەنکـەکـان) 2 کـڵاش (هـەروەها cloche hat، جۆرێ کڵاوی تەنگ و زەنگناسای ژنان) ◌ 1 حفاظ شیشەای 2 کلوش
**clock**[1] /klɒk, US klɑːk/ *noun*
1 کاتژمێر، سەعات (بێجگەلە دەستی) 2 کـات، وەخـت و زەمـان 3 تاکسـیمیتر 4 خێراییپێوی ماشـێن 5 سـەرەخـڕی تـووداری کوڵـکنی شـەلەمکەرە ◌ 1 ساعت 2 زمان 3 تاکسـیمتـر 4 سرعتسنج 5 کلاک
**clock**[2] /klɒk, US klɑːk/ *noun*
نەخشی سەر گۆرەوی نزیک بە قولاپە ◌ کلاک
**clock face** *noun,* also clock dial
ڕووی سەعات یان کاتژمێر ◌ صفحەی ساعت
**clock golf** *noun*
کلەک گۆلف (جۆرێ یاری) ◌ کلاک گولف
**clock radio** *noun*
ڕادیۆی کاتژمێری یان سەعاتدار ◌ رادیـوی ساعتدار
**clock speed** *noun*
خێرایـی کـاتژمێـری یـان سـەعاتی (خێرایـی کارپێکردنی کـامپیوتێر یـان وردەلێکدەرەوەیێ microprocessor) ◌ سرعت ساعتی
**clock tower** *noun*
کەلوو یان برجی سەعات، کەلووی کاتژمێر ◌ برج ساعت
**clock-watcher** *noun*
سەعاتبژێر، کاربژێر، سەعاتدۆز (کرێکارێ کە زوو زوو چاو لە سەعات دەکا تا بزانێ کە تەواو دەبێ) ◌ ساعتپا
**clock-watching** *noun*
سـەعاتبژێـری، سـەعاتدۆزی، کـاربژێری ◌ ساعتپایی
**clockwise** /ˈklɒkwaɪz, US ˈklɑːk-/ *noun*
سـەعاتسـوور، میلسـوور، لە لای یـان بـە لای سـووڕانی میلـی کـاتژمێـر، ڕاسـتسـوور ◌ در جهت حرکت عقربەهای ساعت
**clockwork** /ˈklɒkwɜːk, US ˈklɑːkwɜːrk/ *adjective, noun*
*adj* قورمیشـی *n* میکـانیزمی سـەعات، دەزگـایێ، شتێ کە بە شێوەی خۆکـار ورد و ڕێکوپێـک کار دەکا، هەر میکانیزمێ کە شێوەی سەعات دەدا، زەمبەلـەکێ، سـەعاتی ◌ *adj* کـوکی *n* مکانیسم ساعت، فنری، ساعت
**clod** /klɒd, US klɑːd/ *noun*
1 کـلۆ، کولـۆ، کەسـتەک، ئـەنگوتک، گونـک، گلمتک، کەرسەک: *clods of earth* 2 (نافەرمی) پیاوی گەوج (*adj* cloddy) stupid person ◌ 1 کلوخ 2 آدم احمق
**clodish** *adjective*
گـەوج، کـەر، بەیدەس، هـیچلەدەسنـەهاتوو ◌ احمق، دستوپاچلفتی
**clodishness** *noun*
گەوجی، کەری، بێمێشکی، هیچلەدەسنەهاتوویی، بەیدەسی ◌ حماقت، دستوپاچلفتی بودن
**clodhopper** /ˈklɒdhɒpə(r), US ˈklɑːdhɑːp-/ *noun*
کـەسێکی دەستەوسـان، دەسـخاو، دەسـسـت، بەیدەس، سـتەپەلە ◌ آدم دستوپاچلفتی
**clodhoppers** *noun, pl.*
کەوشی قورس و زلە ◌ کفش یُغور
**clodpole** *noun*

(نافەرمی) کەسێکی گەوج و دەس‌خاو ◌ آدم احمق و دست‌وپاچلفتی

**clog** /'klɒg/ ***noun***

1 کۆسپ، تەگەرە 2 کەوشی بن دارین، کەوشی دارین، تەقتەقیلە، قاپقاپ ◌ 1 مانع 2 کفش تخت چوبی، کفش چوبی

**clog-dance** ***noun***

سەمای قاپقاپی ◌ کلاگ دانس

**clogged** ***adjective***

پڕکراو، داگیراو، گیراو، داخراو، بەستراو ◌ پرشده، بسته

**clogging** ***noun***

سەمای قاپقاپی ◌ کلاگینگ

**cloggy** /'klɒgɪ/ ***adjective*** (cloggier, cloggiest)

1 قورس، تەپ، ناڵەبار، لینج، لیچق 2 گرێ‌گرێ، کلۆکلۆ، گرتم‌گرتم ◌ 1 سنگین، چسناک 2 کلاگی

**cloison** ***noun***

(فەرەنسی) تیغە، سپین، زەمۆمە، مانە (هی خانوو) ◌ تیغه

**cloisonné** /'klwɑ:zɒneɪ, US -'zɒneɪ/ ***noun***

(شتی میناکاری‌کراو) خانەخانە، زوورزوور، زوورەزوورە (بڕوانە champlevé) ◌ حجره‌حجره

**cloisonné enemel** ***noun***

مینای خانەخانە یا زوورزوور ◌ مینای حجره‌حجره

**cloister** /'klɔɪstə(r)/ ***noun***

1 دەیر، رەبەن‌خانە، (ژیانی) رەبەنایەتی 2 سەردەرانە، دالان، ڕێڕەوی سەرداپۆشراو ◌ 1 صومعه، (زندگی) رهبانیت 2 رواق

**cloistered** /'klɔɪstəd, US -tərd/ ***adjective***

گۆشەگیر، لاتەریک، پەرگیر ◌ معتکف

**cloistral** /'klɔɪstrəl/ ***adjective***

دەیری، سەربە دەیر ◌ وابسته به صومعه

**clomp** ***noun***

ڕێگاڕۆیشتنی بە تەپەتەپەوە یان تەپەتەپانە ◌ کلامپ

**clompy** = clumpy

**clone** /kləʊn, US kloʊn/ ***noun***

1 کلۆن (= ڕووەک یان گیانەوەرێ کە بەشێوەیەکی دەسکرد لە خانەکانی ڕووەک یان گیانەوەرێکی تر بەرهەم‌هاتووە و دروست وەکوو ئەو وایە) 2 چوونیەک، هاوشێوە، لێکچوو، کۆپی، هەرەوە، وەکیەک 3 (کامپیوتێر) مودێلی وەکیەک یان هاوشێوە (clonal *adj*؛ clonally *adv*؛ بنەڕەت: لە یۆنانی *klōn* "twig") ◌ 1 کلون 2 بدل، نسخه، مشابه 3 مدل تقلیدی (کامپیوتر)

**clonic** /'klɑ:nɪk/ ***adjective***

کلۆنیک، سەربە ماسوولکەلەرزێ یان ماسوولکەگرژێ ◌ ارتجاعی

**clonk** /klɒŋk, US klɑ:ŋk/ ***noun***

دەنگی زرمە، گرمە، تلپە، تەپە ◌ صدای دنگ

**clonus** /kləʊnəs/ ***noun***

(پزشکی) کلۆنوس، گرژی ماسوولکە، ماسوولکەلەرزێ، ماسوولکەگرژێ (clonicity *n*) ◌ تشنج ارتجاعی

**cloot** ***noun***

1 قەڵەشی سم، سموچک، سمۆرچک 2 Cloot = Clootie ◌ شکاف سم

**Clootie** ***noun***

(زۆرتر لە سکاتلەندی‌دا) ناوێکی devil ◌ کلوتی

**clop** ***noun***

دەنگی زرمەی پێی ئەسپ ◌ کلاپ

**cloqué** /'kləʊkeɪ/ ***noun***

(فەرەنسی) جۆرێ پارچە (بە واتای هەڵتۆقیو) ◌ کلوکی

**close**[1] /kləʊs, US kloʊs/ ***adjective*** (closer, closest), ***adverb, noun***

*adj* 1 نزیک 2 گەرم‌وگوڕ، گیانی‌گیانی، 3 بەستە پێوەدراو، داخراو، گیراو، بەستراو، 4 گرتی پێک‌نزیک، پاڵ‌بەپاڵ، لەپاڵ‌یەک‌دا، پڕ، کەلەکەبرک، سیکەنەسەرخان، چڕ، بە تەنگی یەکەوە، پێکەوەنووساو، پێکەوەچەسپاو، نزیک بە یەک 5 چکۆلە، تەنگ‌وتەسک، بەرتەنگ 6 بۆخاو، خاو، گەرم، قورس، ناخۆش، گنخاو، خەفە (هەوا) 7 شاراوە، نادیار، نهێنی 8 بەرچاوتەنگ، لەچەر، بەغیل، ڕژد 9 سەخت، ڕشت، مجد، شێلگیر *adv* لە پاڵ‌یەک‌دا، نزیک بە یەک، زۆر کورت، بەتەواوەتی، دەوروبەری، نزیکەی *n* 1 جێگای دەورگیراو، دەوروبەر، حەوشە (کلیسا) 2 بن‌بەست، بێ‌سەرەدەر، کوچکە (کۆلان) ◌ *adj* 1 نزدیک 2 صمیمی 3 بسته 4 تنگ هم، متصل 5 کوچک، تنگ 6 خفه (هوا) 7 مخفی 8 خسیس 9 سخت، جدی *adv* نزدیک به هم، کاملاً، در حدود *n* 1 محوطه 2 بن‌بست

**close**[2] /kləʊs, US kloʊs/ ***noun***

دوایی، ئاخر، کۆتایی، دووماهی ◌ پایان

**close call** = close shave

**close-cropped** /ˌkləʊs 'krɒpt, US ˌkloʊs 'krɑ:pt/ ***adjective***, also close-cut

لە بنەوەبڕاو یان لێدراو، سوورکراو، سوور، لە بنەوەداتاشراو، شەش‌تیغ‌کراو (چیمەن، ڕیش و هتد) ◌ از ته زده‌شده

**closed** /kləʊzd, US kloʊzd/ ***adjective***

داخراو، گیراو، کلیل‌دراو، قایم‌کراو، گاڵەدراو، پێوەدراو، بەسراو: ◊ *Keep the door closed* ◊ *This road is closed to traffic* ◊ *He has a closed mind* ◊ *a closed society* ◊ *a closed membership*، کۆتایی‌پێهاتوو، تەواوکراو، دوایی‌پێهاتوو، خەلاس‌کراو ◌ بسته، تعطیل، تمام‌شده

**closed book** ***noun***

مەتەڵ (= شتێ کە کەس سەرەندەری ناکا) ◌ معما

**closed chain** ***noun***

(کیمیا) زنجیره‌ی داخراو ۞ سلسله‌ی بسته

**closed circuit** *noun*

(کاره‌با) بازنه داخراو، خولگه‌داخراو ۞ مدار بسته

**closed circuit television** *noun*

ته‌له‌فزیۆنی بازنه یان خولگه‌داخراو ۞ تلویزیون مدار بسته

**closed economy** *noun*

ئابووری داخراو ۞ اقتصاد بسته

**closedown** /'kləʊz daʊn, US 'kloʊz/ *noun*

1 کۆتایی (به‌رنامه یان بلاوکردنه‌وه) 2 داخستن، داخران، راوه‌ستان ۞ 1 پایان برنامه 2 تعطیل

**closed season** = close season

**closed shop** *noun*

دامه‌زراوه‌ی داخراو ۞ مؤسسه‌ی بسته

**closefisted** *noun*

ده‌س‌قووچاو، پیسکه، رژد، کنوژ، چکووس، tightfisted ,stingy ۞ خسیس، ناخن‌خشک

**close-fitting** /ˌkləʊs 'fɪtɪŋ, US ˌkloʊs/ *noun*

ته‌نگ(وتۆمان)، ته‌نگ (جل‌وبه‌رگ) ۞ چسبان

**close-fought** *adjective*

له پاڵ‌یه‌کدا، لێک‌نزیک، چڕ، بردنه‌وه به‌هۆی جیاوازیه‌کی زۆر که‌م (هه‌ڵبژاردن، پێشبرکێ و هتد) ۞ تنگاتنگ

**close-grained** *adjective*

1 شانه‌پته‌و، سه‌خت، تیوپر، شانه‌توکمه 2 ره‌گاوی، ریشاڵ‌ریشاڵ، ریشاڵاوی ۞ 1 دارای بافت محکم 2 با رگه‌های فشرده

**close-hauled** *adjective*

بای سینگ، به‌ره‌وبا، بای پێشه‌وه (که‌شتی چارۆکه‌دار) ۞ باد سینه

**close-knit** /ˌkləʊs 'nɪt, US ˌkloʊs/ *adjective*

گه‌رم‌وگوڕ، لێک‌دانه‌بڕاو، پێکه‌وه‌گرێدراو، یه‌کگرتوو ۞ صمیمی، متحد

**closely** /'kləʊsli, US kloʊsli/ *adverb*

به وردی، ورد، له پاڵ‌یه‌کدا، نزیک‌به‌یه‌ک: *a closely contested election* ۞ دقیقاً، تنگاتنگ

**closeness** /kləʊsnəs, US kloʊsnəs/ *noun*

1 گه‌رم‌وگوڕی 2 نزیکایه‌تی 3 وردی، دروستی 4 ده‌س‌قووچاوی، رژدی ۞ 1 صمیمیت 2 قرابت 3 دقت 4 خست

**close-run** /ˌkləʊs 'rʌn, US ˌkloʊs/ = close-fought

**close season** /'kləʊz si:zn, US 'kloʊz/ *noun*

وه‌رزی داخراو یان به‌ربه‌ند (راو)، به‌ربه‌ندان، وه‌رزی داخران (پێشبرکێ) ۞ فصل ممنوع، فصل تعطیل

**close quarters** *noun*

شوێنی ته‌سک‌وته‌نگ، ته‌نگه‌به‌ر، جێگای به‌رته‌نگ ۞ مکان محدود

**close-set** /ˌkləʊs 'set, US ˌkloʊs/ *adjective*

له پاڵ‌یه‌که‌وه، له پاڵ‌یه‌ک، لێک‌نزیک، چڕ، پڕ، چڕوپڕ ۞ فشرده

**close shave** *noun*, be a close shave

مه‌ترسی ۞ مخاطره

**closet**[1] /'klɒzɪt, US 'klɑ:zət/ *noun*

1 کومێد، دۆلاب (دیواری)، گه‌نجینه 2 پاشخان، خه‌ڵوه‌تی 3 ژووروچکه، دیوی چکۆله، دیوۆچکه 4 (کۆن) ده‌ستاو ۞ 1 کمد، گنجه 2 پستو 3 اتاقک 4 توالت

**closet**[2] /'klɒzɪt, US 'klɑ:zət/ *adjective*

نهێنی، سه‌ربه‌سته، له بنه‌وه، په‌نامه‌کی ۞ مخفیانه

**close thing** = close shave

**close-up** /'kləʊs ʌp, US 'kloʊs/ *noun*

دیمه‌نی نزیک، وێنه‌ی زل یان درشت، له نزیکه‌وه ۞ نمای درشت

**closing** /'kləʊzɪŋ, US 'kloʊzɪŋ/ *adjective, noun*

*adj* کۆتایی، دوایی: *his closing remarks n* داخستن، به‌ستن، گرتن (کارخانه و هتد): *the closing of the local school* ۞ *adj* نهایی، آخر *n* تعطیل

**closing date** *noun*

دواده‌رفه‌ت، دوایین هه‌ل ۞ آخرین مهلت

**closing price** *noun*

نرخی لای ئێواره، دوانرخ (ستاک) ۞ قیمت نهایی

**closing time** *noun*

کاتی داخستن ۞ ساعت تعطیل

**clostridial** *adjective*

سه‌ربه ته‌شیه، ته‌شیه‌یی ۞ وابسته به کلوستریدیوم

**clostridium** /klɒ'strɪdiəm/ *noun, pl.* clostridia /-diə/

ته‌شیه (به‌کتریایێ که ده‌بێته هۆی نه‌خۆشی botulism و tetenus [توخم *Clostridium*]؛ بنه‌ره‌ت: له‌سه‌ر بنچینه‌ی *klōstēr* یۆنانی "ته‌شی") ۞ کلوستریدیوم

**closure** /'kləʊʒə(r), US 'kloʊ-/ *noun*

1 داخستن، گرتن، به‌ستن، کلیل‌دان، داخراوی، کلیل‌دراوی 2 دوایی پێ‌هێنانی وت‌ووێژ به دانی ده‌نگ، شێوازی کۆتایی‌پێ‌هێنانی دان‌وستان به دانی ده‌نگ ۞ 1 عمل بستن، تعطیل 2 رأی کفایت مذاکرات

**clot** /klɒt, US klɑ:t/ *noun*

1 ده‌له‌مه، په‌نگین، مه‌یینی خوێن، تۆپه‌ڵ، جه‌ڵغه: *They removed a clot from his brain* 2 مرۆڤی گه‌وج ۞ 1 لخته 2 آدم احمق

**clotbur** /'klɒtbɜ:/ *noun*

گیایێ له تیره‌ی daisy، ره‌سه‌نی گه‌رمێنای

ئەمریکا [*Xanthium spinosum*] ۞ نوعی گیاه

**cloth** /klɒθ, US klɔːθ/ *noun, adjective*

*n* 1 پارچە، کوتاڵ، کالا، قوماش، کۆنە، دەسرە، کوتە پارچە، سپیاڵ، بەرۆ 2 بەرگی پیاوانی ئایینی *adj* پارچەیی، کوتاڵی ۞ *n* 1 پارچە، کهنه، تکەی پارچە، دستمال 2 جامەی روحانیت *adj* پارچەای

**cloth-eared** *adjective*

گوێ‌گران، باش‌نەبیستوو ۞ سنگین‌گوش

**clothed** /kləʊðd, US kloʊðd/ *adjective*

لەبەرکردوو، پۆشیو، بەرگ‌پۆشیو ۞ لباس‌پوشیده

**clothes** /kləʊðz, kləʊz, US kloʊðz, kloʊz/ *noun, pl.*

جل‌وبەرگ، کنج، جل، بەرگ، سپیاڵ ۞ لباس

**clothes-basket** *noun*

قرتاڵە یان سەبەتەی جل(وبەرگ) ۞ سبد لباس

**clothes-brush** *noun*

فلچەی سڕین ۞ ماهوت‌پاک‌کن

**clothes-hanger** = hanger

**clothes-horse** *noun*

چوارچێوە (دار یان پلاستیک) بەرگ وشک‌بوونەوە، چوارچێوەی بەرگ لەسەر هەڵخستن ۞ چهارچوب پهن کردن لباس‌ها

**clothes-line** *noun*

تەنافی جل ۞ طناب رخت

**clothes-moth** *noun*, also clothes moth

مۆرانە، مۆرکە، خۆرکە، قارونە، خورک [ *Tineola bisselliella* و جۆرە پێوەندی‌دارەکان] ۞ بید

**clothes-peg** *noun*, also clothes-pin or clothes-spin

گیرە، گیرگە (جل) ۞ گیره

**clothier** /ˈkləʊðiə(r), US ˈkloʊ-/ *noun*

کوتاڵفرۆش، پارچەفرۆش، بەزاز، بەرگ‌فرۆش، جامەفرۆش ۞ پارچه‌فروش، جامه‌فروش

**clothing** /ˈkləʊðɪŋ, US ˈkloʊðɪŋ/ *noun*

جل‌وبەرگ، شمەک، پۆشاک، کنج ۞ لباس، جامه

**cloth of gold** *noun*

زەری ۞ زری

**clotted** *adjective*

مەیو، جەڵغەکردوو، بەستوو، تۆپەڵبوو ۞ بسته

**clotted cream** *noun*

سەرشیر، سەرتوێ، توێژکە: *scones and jam with -d cream* ۞ خامه

**cloth yard** *noun*

یارد (= یەکەیێکی 37 ئینچی بەرامبەر بە ell سکاتلەندی) ۞ یارد

**clotting factor** *noun*

(زیندە(وەر)ناسی) هۆکاری مەیین یان بەستن (لە خوێنا) ۞ عامل انعقاد

**cloture** /ˈkləʊtjʊə/ *noun*

دوایی‌پێ‌هێنان یان یەکلایی‌کردنەوەی وتووێژ بە دانی دەنگ، شێوازی کۆتایی‌پێ‌هێنانی دان‌وستان بە دانی دەنگ، دەنگ(دان)ی مشت‌ومڕبڕ ۞ رأی کفایت مذاکرات

**cloud** /klaʊd/ *noun*

1 هەور، عەور 2 کۆمەڵ، کەڵەکە، تۆپەڵە، چراپی، رەشایی، پۆل 3 لکە، پەڵە، پنکە، پنۆک، لێڵی، تەڵخی، رەگە 4 نەروونی، یەکلایی‌نەکرا(نە)وەیی 5 سێبەر 6 خەفەت، خەم (ئینگلیسی کۆن، کەڵەکەبەرد) *clūd* 2 ۞ 1 ابر 2 توده 3 لکه، تیرگی 4 عدم قطعیت 5 سایه 6 غصه

**cloud-bank** *noun*

پەڵە هەوری نزم و ئەستوور ۞ توده‌ی ابری ضخیم

**cloudberry** *noun, pl.* cloudberries

bramble ی چکۆلەی بە گوڵی سپییەوە، بەرەکەی دەخورێ [*Rubus chamaemorus*] ۞ کلودبری

**cloudburst** /ˈklaʊdbɜːst, US -bɜːrst/ *noun*

1 ڕێژنە، لێزمە، رەهێڵە، شبی، رفتە، تاوەباران، گۆپاڵباران 2 لێشاو، لافاو: *a cloudburst of anger* ۞ 1 رگبار 2 (مجازی) سیل

**cloud-capped** *adjective*

هەورپۆش، هەورگرتوو، هەورداگرتوو ۞ پوشیده از ابر

**cloud chamber** *noun*

(فیزیک) ژوورۆچکەی هەور یان هەڵم ۞ اتاقک ابر

**cloud cover** *noun*

بارستە یا کۆمەڵە هەورێ کە زۆربەی ئاسمان دادەپۆشێ، پۆششی هەوری ۞ پوشش ابری

**cloud-cuckoo-land** *noun*

دنیای خەون و خەیاڵ، دنیای خەیاڵات (بنەڕەت: وەرگێڕدراوی *nephelokokkygia* یۆنانی) ۞ عالم هپروت

**clouded leopard** *noun*

جۆرێ پشیلەی پنکەپنکەی زلەی دارنشین، لە دارستانەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا (یا لە نیپالەوە تا باشووری رۆژهەڵاتی چین و ئیندۆنیزیا) دەبینرێ [*Neofelis nebulosa*] ۞ نوعی گربه

**clouded yellolw** *noun*

جۆرێ پەپوولەی کۆچەر، بە باڵی زەردباو و پەراوێزی رەشەوە [*Colias croceus*] و جۆرە پێوەندی‌دارەکان] ۞ نوعی پروانه

**cloudiness** /ˈklaʊdinəs/ *noun*

تاریکی، دەڵتەنگی، خەمباری، ماتی ۞ تاریکی، غمگینی

**cloudless** /ˈklaʊdləs/ *adjective*

ساو، ساماڵ، سایەقە، بێ‌هەور(وەهەلا، clear :*a cloudless sky*) cloudlessly /ˈklaʊdləsli/ *adv*: (cloudlessness *n* ۞ صاف

**cloud nine** *noun*, be on cloud nine

*still on cloud nine weeks after winning the championship*: خۆشی لە ئەندازەبەدەر، شاگەشکەیی ◌ شادی بیش از حد

**cloudy** /'klaʊdi/ *adjective* (cloudier, cloudiest)

1 هەوری، هەوروهەلا، کەوەڕۆژ: *a grey, cloudy day* 2 تاریک، لێل، تەلخ، تەماوی، شێواو: *The water looked cloudy and not fit to drink* 3 ناڕوون، نادیار ◌ 1 ابری 2 کدر، مغشوش 3 نامعلوم

**clough** /klʌf/ *noun*

دەربەند یان کەندەلان، شیوودەرە (ئەلمانی بنەڕەت) ◌ کلاف

**clout** /klaʊt/ *noun*

1 (نافەرمی) مشت، لێدان، پیاکێشان 2 (خالی) نیشانە، ئامانج 3 هێز، دەسەلات، کاریگەری، دەس‌ڕۆیشتوویی 4 ناڵ 5 کۆنە، پەڕۆکۆن ◌ 1 مشت، ضربه 2 آماج 3 قدرت، نفوذ 4 نعل 5 کهنه

**clove**[1] /kləʊv, US kloʊv/ *noun*

1 داری مێخەک [*Syzygium aromaticum*] (هەروەها *Eugenia caryophyllus*)] 2 گەردە یان هاراوەی مێخەک 3 گوڵی وشکەوەبووی داری مێخەک (وەکوو ناڵەت و زەردەچێوە بەکاردێنرێ) ◌ 1 درخت میخک 2 پودر میخک 3 گل خشکیدەی درخت میخک

**clove**[2] /kləʊv, US kloʊv/ *noun*

دەنک، دانە، قاش ◌ حبە

**clove**[3] /kləʊv, US kloʊv/ = past of cleave

**clove hitch** *noun*

گرێی دووقوڵفە، گرێی قلیش‌دار ◌ گرە دو خفت

**cloven** /'kləʊvn, US 'kloʊvn/ = past participle of cleave

**cloven footed** *adjective*

قەڵەشیو، قلیشاو، دووسم، قلیش‌بردوو (سم) ◌ شکاف‌دار

**cloven hoof** *noun*, also cloven foot

دووسم(ە)، سمی قەڵەش‌بردوو، سمی قەڵەشیو ◌ سم شکافته

**cloven hoofed** *adjective*

قەڵەشیو، قلیشاو، دووسم، قلیش‌بردوو (سم) ◌ شکاف‌دار

**clover** /'kləʊvə(r), US 'kloʊ-/ *noun*

(ڕووەک‌ناسی) سەمەن، شەودەر، نەفەل، سێپەڕە، شەوەر، هەندەکۆ [تۆخم *Trifolium*]: زۆر جۆرن] ◌ شبدر

**cloverleaf** /'kləʊvəli:f, US 'kloʊvər-/ *noun, pl.* -afs or cloverleaves

گەلاشەودەر، گەلاسێپەڕە؛ یەکتربڕی شەوەری یان ناهاوئاست، چوارڕێیانەی شەوەری یا ناهاوئاست ◌ برگ شبدر؛ تقاطع غیر هم‌سطح

**Clovis** /'kləʊvɪs/ *noun, adjective*

(کۆنەوارناسی) سەربە چاندی کۆنی سوورپێستانی ئەمریکای باکووری و ناوەندی، دەوروبەری 11,000-11,500 ساڵ لەوەپێش و پێش‌تر، پلارە بەردینەی (لە بەردی چەخماخ flint و شێوە گەلا) کووزداری نووک‌داریان بۆ ڕاو بەکاردێنا (بنەڕەت: لە ناوی *Clovis*، شاریکی ڕۆژهەلاتی نیومەکسیکۆ، نزیک بەوێ ئەو پلارە بەردینانە دۆزراوەتەوە) ◌ کلوویس

**clown** /klaʊn/ *noun*

1 گاڵتەچی، گاڵتەجاڕ، گەپجاڕ کۆستەبابی، تیزەزاڕۆک، قەشمەر، وشکەڕن، تەڵخەک 2 (کۆن) لادێیی، دیهاتی، farmer - 3 boor countryman ◌ 1 دلقک 2 روستایی

**clown anemone** *noun*

ماسییێکی میل‌نارنجی یا سپی [ *Amphiprion ocellaris*] ◌ نوعی ماهی

**clownery** /klaʊnəri/ *noun, pl.* clowneries

گاڵتەچێتی، گاڵتەجاڕی، گەپجاڕی، قەشمەری ◌ لودگی

**clownfish** *noun, pl.* same or clownfishes

ماسی‌یەقەشمەرە، جۆرێ ماسی چکۆلەی ڕەنگ‌ڕۆشن [*Amphiprion percula* و جۆرەکانی تر] ◌ نوعی ماهی

**clowning** *noun*

گاڵتەچێتی، گاڵتەجاڕی، تەڵخەکبازی، گاڵتەبازاڕی، گەپجاڕی ◌ لودگی، دلقک‌بازی

**clownish** /'klaʊnɪʃ/ *adjective*

گاڵتەجاڕانە (clownishly *adv*، clownishness *n*) ◌ دلقک‌وار

**cloxacillin** *noun*

پێنی‌سیلینێکی نیوەدەسکردی دەمی $C_{19}H_{17}ClN_3NaO_5S$، کاریگەری دژی staphylococci هەیە و beta lactamase دەردەدا ◌ کلوکساسیلین

**cloyed** *adjective*

(لێ)بێزراو ◌ دلزده

**cloying** /'klɔɪɪŋ/ *adjective*

بێزاوی، قێزەون، ناخۆش: *cloying sweetness* ◌ مهوع

**cloyingly** /'klɔɪɪŋli/ *adverb*

بێزاوی‌یانە، قێزەونانە، بێزەونانە ◌ به طور مهوع

**clozapine** *noun*

کلۆزاپین: دەرمانێکی ئانتی‌سایکۆتیک $C_{18}H_{19}ClN_4$ antipsychotic، لە تیمار یان چارەسەرکردنی شیزۆفرنیا schizophrenia بەکاردێنرێ ◌ کلوزاپین

**cloze test** /'kləʊz test, US 'kloʊz/ *noun*

تاقی‌کاری وشەدانان ◌ تست واژه‌گذاری

**clr** *abbreviation* 1clear 2 clearance

**club**[1] /klʌb/ *noun*

1 یانە 2 ناوەند، نیوەند، جەرگە، بنکە، مەکۆ،

a chess/film/movie, گاستین، یانەی شەوانە: Manchester United Football ◊ etc. club Club 3 داری یاری گۆلف و هتد ◌ 1 باشگاه 2 انجمن، کانون، کلوب شبانە 3 چوگان

**club²** /klʌb/ *noun*
تیلا، داردەست، گۆپاڵ، تۆیز، کێتە، کوتەک، گورز ◌ چماق، باتوم، گرز

**club³** /klʌb/ *noun*
*the five/queen/ace of clubs* :خاچ (پەڕین) ◌ خاج

**clubbability** *noun*, also clubability
ڕووخۆشی ◌ اجتماعی بودن، معاشرتی بودن

**clubbable** *adjective*, also clubable
ڕووخۆش، شایانی ئەندامێتی لە یانەدا، sociable ◌ اجتماعی، معاشرتی

**club bag** *noun*
جۆرێ کیفی جووتدەسکی چەرمی نەرم، بۆ ڕێبواری و سەفەر یان بە گشتی بۆ هەموو شتێ بەکاردێتری ◌ کلوب بگ

**clubber** *noun*
ئەندامی یانە(شەوانە)، فێرەیانە، یانەڕەو (شەوانە): *The venue was packed with 3000 clubbers* ◌ کلوب شبانەرو

**clubbing** /ˈklʌbɪŋ/ *noun*
بۆ یانە(شەوانە)چوون، یانەڕەوی (شەوانە): *They go clubbing most weekends* ◌ کلوب شبانەروی

**clubby** *adjective* (clubbier, clubbiest)
1 (زۆر) دۆستانە، ڕووخۆش، کۆمەڵایەتی، cliquish = 2 friendly sociable (clubbines *n*) ◌ دوستانە، اجتماعی، معاشرتی

**club car** *noun*, also bar car or lounge car
جۆرێ واگۆنی ڕێی ئاسن یان شەمەندەفەر بە کورسی و سەندەڵی ئاسوودەوە، نان و ئاو و خواردنەوە دابین دەکا ◌ واگن رستوران

**club chair** *noun*
جۆرێ سەندەڵی ئاسوودە و بەرگتێگیراوی قورس و نزم، دەسک و لاکانی قایم و قورسن و پشتەکەی نزمە ◌ کلوب چیر

**club-foot** *noun*, *pl.* club-feet
1 پێیگورزی (زگماکی)، گۆجی 2 پاگورزە: جۆرێ toadstoolی پێشەلان [*Clitocybe clavipes*] ◌ 1 پای چنبری یا چماقی 2 کلاب‌فوت

**club-footed** *adjective*
پێگورز، پاگورز، پێگورزی، گۆج ◌ پاچنبری

**club fungus** *noun*
کارگ یان کەڕووە گورزانە (یان گورزی)، کارگ یان کەڕووی باسیدیۆمایسیتی سەربە خێزانی Clavariaceae ◌ قارچ گدویی

**clubhouse** /ˈklʌbhaʊs/ *noun*, *pl.* clubhouses
یانە، یانەوبەرە، خانووبەرەی یانە ◌ باشگاە، ساختمان باشگاه

**clubland** /ˈklʌblænd/ *noun*
گەڕەکی یانە شەوانەیییەکان: *modern clubland* ◌ محلەی کلوب‌های شبانە

**club-law** *noun*
قانوونی زۆر(ەملێ)، زاکوونی سەرەڕم یان زۆرداری ◌ قانون زور

**clubman** *noun*, *pl.* clubmen
ئەندام لە یانەدا، ئەندامی یانە ◌ عضو کلوب

**clubmoss** *noun*
گیایەکی بێگوڵی کەمبالا [پۆل Lycopsida: زۆر جۆرن] ◌ کلوب‌موس

**club-root** *noun*
نەخۆشی ڕەگتێلایی یان ڕەگەماسین، نەخۆشییێکی ڕووەکی تیرەی کەلەم، ڕەگ و ڕیشەیان دەماسێ، بەهۆی کەڕووە لینجەوە *Plasmodiophora brassicae*] تووش دەبێ slime mould ◌ بیماری گرزریشگی

**clubrush** *noun*
گیاێکی درێژی ئاوی قامیشئاسا، بۆ چنین بەکاردێتری [*Scirpus lacustris* و جۆرەکانی تر] ◌ کلوب‌راش

**club sandwich** *noun*
بابۆڵەی یانە، بابۆڵەی دووتوێ ◌ ساندویچ کلوب

**club soda** = soda water

**cluck** /klʌk/ *noun*
1 گارەگار، گارکەگارک، قرتەقرت (ب.ت. ئەو دەمەی کە جووجکەکانی بانگ دەکا) 2 بۆڵەبۆڵ ◌ 1 قدقد 2 غرولند

**clue** /kluː/ *noun*
1 سەرەداو، سەرەپەت، سەرەتا، سەرەتاڵ، سەررستە، سۆراغ، زانیاری، ئاگاداری، هەواڵ *Diet may hold the clue to the causes of migraine* 2 نیشانە، شەقڵ ◌ 1 سرنخ، اطلاع، اطلاعات 2 علامت

**clued-up** *adjective*, also clued-in
ئاگادار (هەبوونی زانیارییەکی زۆر لەبابەت شتێکەوە) ◌ مطلع

**clueless** /ˈkluːləs/ *adjective*
(نافەرمی) نەفام، ناتێگەیشتوو، زۆرگەوج: *He's completely clueless about computers* ◌ احمق، بی‌خبر

**cluelessly** /ˈkluːləsli/ *adverb*
نەفامانە، ناتێگەیشتووانە، گەوجانە ◌ احمقانە

**cluelessness** /ˈkluːləsnəs/ *noun*
نەفامی، ناتێگەیشتوویی، گەوجی ◌ حماقت

**clumber** /ˈklʌmbə/ *noun*, also Clumber or clumber spaniel
کلامبێر، سەگی پێکوڵ (بنەڕەت: لە ناوی پارکی *Clumber* لە ناتینگهامشایر Nottinghamshire) ◌ کلومبر

**clump**[1] /klʌmp/ *noun*
گورزە، دەسک، چەپک، کۆمەڵە، پۆل، کۆر، کۆما، گروپ، کۆمەڵ، هێشوو: *a clump of trees/bushes* ◌ دستە، کپە، مجموعە، خوشە

**clump**[2] /klʌmp/ *noun*
(دەنگی پێ) خرمەخرم، تەپەتەپ، کوتەکوت، زرمەوکوت، زرمەوهۆر: *I heard the heavy clump of feet on the stairs* ◌ صدای پا، گرُپ گرُپ

**clumpy** /klʌmpi/ *adjective* (clumpier, clumpiest)
گەورە و ئەستوور و قورس، نالەبار، کەرکەنۆڵ، پووتەقوڕ (کەوش، پۆتین و هتد) ◌ بزرگ، ضخیم و سنگین

**clumsily** /ˈklʌmzɪli/ *adverb*
شپرزانە، ناجۆر، ناشارەزایانە ◌ شلخته‌وار

**clumsiness** /ˈklʌmzinəs/ *noun*
ناشارەزایی، دەسخاوی، دەسسستی، چاونەکراوەیی، خاوی ◌ ناشی‌گری، بی‌مهارتی

**clumsy** /ˈklʌmzi/ *adjective* (clumsier, clumsiest)
1 دەسخاو، دەسگران، تەپ، تەپلۆس، داوەشاو، دەسسست، سستوبەلەشت، سستەبەلە، خاو، خرس، کنگگران، خاووخلیچک 2 ناشی، ناشارەزا، زلحۆ، پەڵحە 3 (زلەو)نالەبار، زل، ناقۆلا، ناجۆر، قەبە، بارناخۆش، کارناخۆش ◌ 1 دست‌وپاچلفتی 2 ناشی 3 بدقواره، ناهنجار

**clung** /klʌŋ/ = past and past participle of cling

**Cluniac** /ˈkluːnɪæk/ *noun*
رەبەنی لە تیرەی بێنێدیکتی، لە Cluny رۆژهەڵاتی فەرەنسە دامەزرا ◌ کلونیاک

**clunk** /klʌŋk/ *noun*
دەنگی شەقە، زرمە ◌ صدای دنگ

**clunker** /ˈklʌŋkə(r)/ *noun*
1 داشقەشکاو، کەلاک، چەپەرەشر 2 لێ‌هەڵقلیشان، شاشی، هەڵەی گەورە یان زەق ◌ 1 ابوطیاره، قراضه 2 گاف

**clunky** /ˈklʌŋki/ *adjective* (clunkier, clunkiest)
قورس و نالەبار، ناقۆلا، نابار، ناهەموار، بارناخۆش، پووتەقوڕ (پۆتین و هتد): *clunky leather shoes* ◌ سنگین و ناجور

**clupeoid** /ˈkluːpɪɔɪd/ *adjective*
(گیانەوەرناسی) سەربە ماسی یان دەستە ماسی‌یی (Clupeiformes) کە بریتین لە herring و anchovy ◌ کلوپیود

**cluster** /ˈklʌstə(r)/ *noun*
1 هێشوو، بۆڵ، کۆمەڵ، کۆمەڵە، کۆر، پۆل، دەسک، چەپک، دەستە، گروپ، رەوە، گەلە، کۆما، لۆدە: *The plant bears its flowers in a cluster* ◊ *a cluster of spectators* ◊ *clusters a little cluster of houses* ◊ *cluster of stars*
2 ریز 3 (کیمیا) کۆمەڵێ لە گەردیلەکانی هەر ئەو توخمە، هێشووە، بۆڵە 4 (دەنگناسی) هێشوو: دەستە یان کۆمەڵە بزوێنێ کە لە وشە یان دەستەوشەیێکدا پێکەوە دێن، وەک /str/ لە سەرەتای *string* دا: *a consonant -uster* ◌ 1 خوشه، انبوهه، دسته، کپه 2 ردیف 3 کلاستر 4 خوشه

**cluster analysis** *noun*
(ئامار) شیکردنەوە یان شیکاری هێشوویی ◌ تجزیه‌ی خوشه‌ای

**cluster bean** = guar

**cluster bomb** *noun*
بۆمبی هێشوویی، بۆڵۆمب ◌ بمب خوشه‌ای

**clustered** *adjective*
هێشوویی، بۆڵ‌بۆڵ، هێشووهێشوو ◌ خوشه‌ای

**cluster fly** *noun*
مێشەهێشوو: مێشێ کە بەرلە زستان لە خانووەکانا شتێکی هێشووی دەنێتەوە [*Pollenia rudis* و *Thaumatomyia notata*] ◌ نوعی مگس

**cluster headache** *noun*
سەرئێشەی هێشوویی: جۆرێکی سەرهەڵدەرەوە کە لەودا لە لایێکی سەر ئێشێکی سەختی دەبێ (ب.ت. چاو و لاجانگ) ◌ نوعی سردرد

**cluster pine** = maritime pine

**clutch**[1] /klʌtʃ/ *noun*
1 گرتن، دەس یان چنگ لێ‌گیرکردن، گیرخستن، بەرنەدان 2 چنگ 3 باوەش، حمێز، ئامێز 4 کلاچ، پێدالی کلاچ (ماشین): *Put your foot on the clutch* 5 (clutchs) دەس‌بەسەراگرتن، کۆنترۆڵ، مەهار، هێز، دەسەڵات: *He managed to escape from their clutches* ◌ 1 عمل گرفتن 2 چنگ، بغل 3 کلاچ 4 پدال کلاچ 5 (در جمع) مهار، قدرت

**clutch**[2] /klʌtʃ/ *noun*
1 جووچکە پێکەوەبووەکان، جووچکە پێکەوە سەرجووقاندووەکان 2 راوکە، رامکە 3 دەستە، کۆمەڵە، کۆما، لۆدە، کۆگا، ران، مێگەڵ، رەوە ◌ 1 جوجه‌های هم‌زاد 2 دوره‌ی تخم‌گذاری 3 گروه، کپه، گله

**clutch bag** *noun*
جانتا یان کیفی میوانی، جانتای شەوانە ◌ کیف مهمانی

**clutter** /ˈklʌtə(r)/ *noun*
1 شێواوی، شلووقی، تێکەولێکەیی، شپرزەیی، بێ‌سەروبەرەیی 2 وردەوپردە، شڕەوشاتاڵ ◌ 1 بهم‌ریختگی 2 خرت و پرت

**cluttered** /ˈklʌtəd, US -tərd/ *noun*
1 پڕ لە، دارماڵ: *a cluttered room/desk* 2 شێواو، شلووق، تێکەولێکە، شپرزە،

بێ‌سەروبەرە: *a cluttered mind* ◌ 1 پر از، مملو 2 بهم‌ریخته، بی‌نظم

**Clydesdale** *noun*
1 رەگەزی ئەسپی بارگین یان بارکێش (لە سکاتلەند) 2 جۆرێ سەگی نژادی چکۆلانەی terrier (بنەڕەت: لە ناوی رووباری *Clyde* لە سکاتلەند، لە بنەڕەتا ئەو نژادە لەوێ زاوزێی کردووە) ◌ کلیسدال

**clypeal** *adjective*
مەتالۆ(چ)کەیی، مەتال‌چەیی ◌ وابسته به کلوپیوس

**clypeus** /ˈklɪpɪəs/ *noun, pl.* clypei /-pɪʌɪ/
(مێروناسی) مەتالۆ(چ)کە، مەتالەخرە (لە پێش سەری مێرووەوە، بنەڕەت: لە لاتینەوە بە واتای "round shield") ◌ کلوپیوس

**clyster** /ˈklɪstə(r)/ = enema

**Clytemnestra** *noun*
کلیتیمنێسترا: ژن و بکوژی ئاگامێمنون Agamemnon ◌ کلیتمنسترا

**Cm** symb. the chemical element corium

**cm** *abbreviation* centimetre

**Cmdr** *abbreviation* commander

**Cmdre** *abbreviation* Cdre

**CMOS** *noun,* from Complementary Metal Oxide Semiconductor
(ئێلیکترۆنیک) سی‌ئێم‌ئۆئێس: 1 تێکنۆلۆژی سازکردنی ئەو خولگە یەک‌پارچانەی کە بە پاوەرێکی کەم کار دەکەن 2 تەلەزمە chip ێ کە بەپێی تێکنۆلۆژییەکی وا دروست کراوە ◌ سی‌ام‌اواس

**CMV** *abbreviation* cytomegalovirus

**CND** /ˌsiː en ˈdiː/ *abbreviation* Compaign for Nuclear Disarmament
سی‌ئێن‌دی (= ڕێکخراوەی بەربەرەکانی بۆ دامالینی چەکی نیوکی، لە بریتانیا) ◌ سی‌ان‌دی

**cnemial crest** /ˈ(k)niːmɪəl/ *noun*
(لە لاقی زۆر لە شیردەران، باڵندەکان و دایناسۆرەکان) پۆپە، تاج یان کڵاوەی لوولاکی ◌ کنمیال کرست

**CNG** *abbreviation* compressed natural gas
(لە ئەمریکا) سی‌ئێن‌جی ◌ سی‌ان‌جی

**cnidae** *pl.* same = nematocyst

**Cnidaria** /(k)nʌɪˈdɛːrɪə/ *noun, pl.*
(گیانەوەرناسی) گەزنەکان: لقێکی گیانەوەرە بڕبڕەدارە ئاوییەکان کە coelenterate ـەکیا دەگرێتەوە (بنەڕەت: لە *knidē* یونانی "nettle") ◌ کنیداریا

**cnidarian** *noun, adjective*
(گیانەوەری) گەزن(ەک) ◌ کنیدارین

**cnidoblast** *noun*
خانەی دەزوویی، خانەگەزنە: خانەیێ کە لە نێو ئەودا nematocyst ێ پەرە دەستێنێ ◌ کنیدوبلاست، سلول رشته‌ای

**cnidocil** *noun*
مۆوڵەگەزنە: چوکلەیێکی هەستەکی sensory درک‌ئاسا یان موویین کە لەسەر خانەگەزنە ێ cnidoblast هەڵکەوتووە و باوەڕ وایە کە بە هاندانی ئەو nematocyst ئازاد دەبێ ◌ کنیدوسیل

**cnidocyst** = nematocyst

**cnidophore** *noun*
خانەگەزنەهەڵگر، دەزووهەڵگر: بەش یان ئەندامێ کە خانەگەزنەکان cnidoblast هەڵدەگرێ ◌ کنیدوفور

**cnidophorous** *adjective*
خاوەنی خانەگەزنەهەڵگر، دەزووهەڵگردار ◌ کنیدوفوروس

**CNN** /ˌsiː en ˈen/ *abbreviation* Cable News Network
(لە ئەمریکا) سی‌ئێن‌ئێن ◌ سی‌ان‌ان

**CNS** *abbreviation* central nervous system
(لە ئەمریکا) سی‌ئێن‌ئێس: دەزگا یان کۆئەندامی دەماری ناوەندی ◌ سی‌ان‌اس، دستگاه عصبی مرکزی

**CO** /ˌsiː ˈəʊ, ˈoʊ/ *abbreviation* Commanding Officer
ئەفسەری فەرماندەر یا فەرماندار ◌ افسر فرمانده

**Co**[1] symb. the chemical element cobalt

**Co**[2] /kəʊ, US koʊ/ *abbreviation* 1. company 2. county
1 نیوکۆیی، کومپانیا 2 داروودەستە ◌ 1 شرکت 2 هم‌پالکی‌ها

**c/o** *abbreviation* care of
لە لایەن، بە دەستی، بە هۆی (پۆست) ◌ توسط، به وسیله‌ی

**co-** /kəʊ, US koʊ/ *prefix*
پێشگر: لەگەڵیەک، پێکەوە، پێک، هاو، ئاو، ئاوەڵ، شاگرد، هاوبڵە، هاوبەش، بەشدار، هاوکار، تێکەڵ، یاریدەدەر، دوا یان ئاوەڵ: *coauthor* ،*coextensive* ،*co-driver* ،*coexist* (لە بیرکاری) *coenzyme* ،*coequal* *coworker* یان ئەستێرەوانیدا) واتای تەواوکەر دەگەیێنێ، سەربە یان تەواوکەری گۆشەیێ پێکدێنێ: *cosine* (لە لاتینەوە) ◌ پیشوند: با، هم، دارای یک درجه، شریک، همکار، مختلط، دستیار، کمک

**coacervate** /kəʊˈasəveɪt/ *noun, adjective*
*n* (کیمیا) کۆئاسێرڤەیت، کۆمەڵکان: دۆخێکی شلەی لینجی پڕمڵ colloid یان کۆمەڵکەیێ لە وردەدڵۆپی ملی یان کۆلوئیدی کە بەهۆی هێزە راکێشەرە ئێلیکترۆستاتیکەکانەوە پێکەوە نووساون *adj* وکەڵەکەبەستوو، کۆمەڵکەبوو، سەریەک‌کەوتوو، کۆوەبوو، کەڵەکەبوو ◌ *n* کواسروات *adj* کومه‌شده، جمع‌شده

**coacervation** *noun*
کۆمەڵکەبوون، کۆمەڵکەبەستن، سەریەک‌کەوتن، کـۆوەبـوون، کـەڵـەکـەبـوون ◇ کومـەشـدن، انباشته‌شدن

**coach**[1] /kəʊtʃ, US koʊtʃ/ *noun*
1 پاس (بۆ شارەوشار) 2 (شەمەندەفەر) عەرەبانە، واگۆن 3 کالیسکە ◇ 1 اتوبوس 2 واگن 3 دلیجان

**coach**[2] /kəʊtʃ, US koʊtʃ/ *noun*
راهێنەر یان مامۆستای تایبەتی ◇ مربی یا معلم خصوصی

**coach box** *noun*
کورسی کالیسکەوان ◇ صندلی کالسکه‌ران

**coach-builder** *noun*
بانساز، بانچی، باندروسکەر ◇ اتاق‌ساز

**coach-built** *adjective*
دارین، داری، لەدار (وەکوو بانی ماشین) ◇ چوبی

**coach dog** = Dalmatian

**coach house** *noun*
کالیسکەخانە ◇ کالسکه‌خانه

**coaching** /'kəʊtʃɪŋ, US 'koʊtʃ-/ *noun*
راهێنەری، پرۆسەی راهێنان ◇ مربی‌گری

**coachload** /'kəʊtʃləʊd, US 'koʊtʃloʊd/ *noun*
پاسێ پڕ لە ، پاس‌بەرە (ئەو خەڵکەی کە پێکەوە لە پاسێکدا هات‌وچۆ دەکەن): *Tourists were arriving by the -hload* ◇ یک اتوبوس پر از

**coachman** /'kəʊtʃmən, US 'koʊtʃ-/ *noun, pl.* coachmen
کالیسکەوان، کالیسکەچی ◇ کالسکه‌ران

**coach park** *noun*
شوێنی راگرتنی پاسەکان، پاس‌خانە ◇ پارکینگ اتوبوس‌ها

**coach station** *noun*
وێسگەی پاس ◇ ایستگاه اتوبوس

**coach trip** *noun*
سەفەر یان گەڕان بە پاس ◇ سفر با اتوبوس

**coachwhip** *noun*
1 جـۆرێ مـاری بێ‌ژەی ئـەمریکای بـاکووری 2 [*Masticophis flagellum*] (لە ئەوسترالیا) = whipbird ◇ نوعی مار

**coachwood** *noun*
باریکەدارێکی دارستانە بارانی‌یەکانی ئەوسترالیا و نیـوگینی [*Ceratopetalum apetalum*] ◇ نوعی درخت

**coachwork** /'kəʊtʃwɜːk, US 'koʊtʃwɜːrk/ *noun*
بـان، وەتـاغ (= پێکهاتـەی سـەرەکی دەرەوەی ماشینەکانی ڕێگا و واگۆنەکان)، bodywork ◇ اتاق

**coaction** *noun*
1 زۆری، زۆرلـێـکـردن، زۆرەملـێتی، تەنگـەتاوکردن 2 هاوکـاری، ئالیکـاری ◇ 1 اجبار، اکراه 2 تعاون

**coactive** /kəʊ'æktɪv/ *adjective*
بـەزۆر، تـەوزیمی، زۆرەملـێ، زۆرەملـێ، تەنگەتاوی ◇ اجباری، اضطراری

**coadjutant** /kəʊ'ædʒətənt/ *adjective, noun*
*adj* یاریـدەدەر، یارمـەتی‌دەر *n* یـار، پـشتیوان، پشت ◇ *adj* یاری‌دهنده *n* یار

**coadjutor** /kəʊ'adʒʊtə/ *noun*
1 یاریـدەدەر، assistant 2 دواقەشـە، یاریدەدەری قەشە ◇ 1 معاون 2 معاون کشیش

**coagulability** *noun*
لەمەیین‌هاتوویی ◇ انعقادپذیری

**coagulable** /kəʊ'agjələbl/ *adjective*
لەمەیین‌هاتوو، دەمەیێ، مەیەنی ◇ انعقادپذیر

**coagulant** /kəʊ'agjʊlənt/ *noun*
مەیێنـەر، گیرسێنەر، گیرسێنە، توێەڵکەرە ◇ منعقدکننده

**coagulase** /kəʊ'agjʊleɪz, US -s/ *noun*
(زینـدەکیمیـا) هـەوێنـەی مەیانـدن، مەیێنـە، هەوێنەیێ کە دەبێتە هۆی مەیین (ب.ت. خوێن یان پلازما) ◇ کواگیولاز

**coagulate** *adjective*
مـەیو، گیرسـاو، توندبوو، جـەڵـتەبوو، بەسـتوو، گورواو ◇ منعقدشده، بسته

**coagulation** /kəʊˌægju'leɪʃn, US koʊ-/ *noun*
مەیین، گیرسان، رچان، توێـەڵبوون، توندبوون، جەڵتەبوون، بەستن، گیربەندتێکەوتن، گوروان، گروان، بزرکان؟ ◇ انعقاد، بستن، دلمه‌شدگی

**coagulation of proteins** *noun*
مەیینی پرۆتئینـەکـان، گیرسـانی پرۆتئینـەکـان ◇ انعقاد پروتئین‌ها

**coagulation time** *noun*
کات یا ماوەی مەیین یان گیرسان ◇ زمان انعقاد

**coagulative** *adjective*
گیرسێنەر، مەیێنەر ◇ دلمه‌کننده

**coagulum** /kəʊ'agjʊləm/ *noun, pl.* coagula /-lə/
جەڵـتە، خوێنەمـەیو، توێەڵـەمەیو، مـەیـک، خوێنەپەنگە ◇ علقه، دلمه

**coal** /kəʊl, US koʊl/ *noun*
خەڵـووز، کـۆمر، خەڵـووزی بـەرد، لەتکـە یـان پارچە خەڵووز (ئەڵمانی بنەڕەت) ◇ زغال‌سنگ، تکه‌ی زغال‌سنگ

**coal-bed** *noun*, also coal-seam
(لە کاندا) چین یا رەگەی خەڵووز ◇ رگه‌ی زغال

**coalbin** *noun*
خەڵـووزدان، جـێ‌خەڵـووز، تەنەکەخەڵـووز ◇ جازغالی

**coal-black** *adjective*
ڕەش، وەک زووخاڵ، وەک قاژوو، ڕەشی ڕەش ◌ مشکی

**coal-dust** *noun*
خاکەخەڵووز ◌ خاک‌زغال

**coaler** *noun*
1 کەشتی خەڵووزکێش 2 دەزگایێ بۆ بارکردنی خەڵووز ◌ کوالر

**coalescence** /ˌkəʊəˈlesns, US ˌkoʊə-/ *noun*
هاوبەندی، یەکێتی، یەک‌گرتن، یەک‌پارچەیی، تێکەڵ‌کردن، تێک‌هەڵکێشان، یەکخستن، بوونەیەک ◌ ائتلاف، اتحاد، ادغام، هم‌آمیختگی

**coalescent** /ˌkəʊəˈlesnt, US ˌkoʊə-/ *adjective*
تێک‌هەڵکێشراو، یەک‌خراو، یەک‌گرتوو ◌ بهم‌آمیخته

**coalface** /ˈkəʊlfeɪs, US ˈkoʊl-/ *noun*
ڕەگەی خەڵووز، چین یان توێی خەڵووز ◌ رگەی زغال‌سنگ

**coalfield** /ˈkəʊlfiːld, US ˈkoʊl-/ *noun*
خەڵووزەلان، خەڵووزان، ناوچەی خەڵووز لێ‌هەڵکەوتوو، خەڵووزستان ◌ حوزەی زغال‌سنگ

**coal-fired** *adjective*
بەکارهێنانی خەڵووز وەک سووتەمەنی fuel: *a coal-fired power station* ◌ کاربرد زغال‌سنگ به عنوان سوخت

**coalfish** = saithe

**coal gas** *noun*
گازی خەڵووز (زۆرتر هایدرۆژین، مێتان و یەکۆکسایدی monoxide کاربۆن، جاران بۆ ڕۆشنایی و گەرما بەکاریان دێنا) ◌ گاز زغال‌سنگ

**coal-heaver** *noun*
خەڵووزکێش ◌ زغال‌کش

**coaling station** *noun*
وێستگە یان شوێنی بارکردنی خەڵووز ◌ ایستگاه بارگیری زغال

**coalition** /ˌkəʊəˈlɪʃn, US ˌkoʊə-/ *noun*
1 هاوبەندی، هەڤاڵبەندی، هاوپەیمانی، هاوپەیمانی کاتی (نێوان پارتە سیاسییەکان بە مەبەستی دامەزراندنی حکومەتێ) 2 حکومەتی هاوبەندی 3 تێک‌هەڵکێشان، کردنەیەک ◌ 1 ائتلاف، ائتلاف موقت (میان احزاب سیاسی به منظور تشکیل دولت) 2 دولت ائتلافی 3 ادغام

**coalman** /ˈkəʊlmən, US ˈkoʊl-/ *noun, pl.* coalmen
خەڵووزفرۆش ◌ زغال‌فروش

**coal measures** *noun, pl.*
ڕەگەکانی خەڵووز، چینەکانی خەڵووز ◌ رگەهای زغال‌سنگ

**coal mine** *noun*
کانگا (یان کانگە)ی خەڵووز، خەڵووزکان ◌ معدن زغال‌سنگ

**coal miner** *noun*
کرێکاری کانگای خەڵووز یان خەڵووزکان ◌ کارگر معدن زغال‌سنگ

**coal pit** = coal miner

**coal scuttle** *noun*
خەڵووزدان، تەنەکەخەڵووز ◌ سطل زغال

**coal-seam** *noun*
توێ یان چینی خەڵووز ◌ لایەی زغال‌سنگ

**coal tar** *noun*
تاری خەڵووز، قەتران: *the powerful smell of coal tar soap* ◌ قطران

**coal tit** *noun*, also cole tit
(باڵندەناسی) جۆرێ گۆرەوی‌چنەی چکۆلەی پشت‌بۆر، سەر و مل ڕەش، کولمەسپی [ *Parus ater* ] ◌ نوعی پرنده

**coaly** /ˈkəʊlɪ/ *adjective*
خەڵووزدار، خەڵووزین، خەڵووزئاسا ◌ دارای زغال‌سنگ، زغال‌سنگ‌مانند

**coalming** /ˈkəʊmɪŋ/ *noun*, also coamings
لێواری بەرز ◌ لبەی بلند

**coaptation** /ˌkəʊæpˈteɪʃ(ə)n/ *noun*
1 گونجان، ساز، سازان، داهاتن، ڕێک‌کەوتن، پێکەوەسازان، پێکەوەگونجان 2 ساڕێژبوون، گۆشتەوزوون(هێنان)، چابوونەوە، یەک‌گرتنەوە، خوزهێنانەوە ◌ 1 انطباق، سازگاری، توافق 2 التیام

**coarctate** /kəʊˈɑːkteɪt/ *adjective*
(توێکاری و زیندەناسی) پەستێنراو، پەساوا، تێک‌ترنجاو، پەستێوراو، کرژبوو، هەڵقرچاو ◌ فشرده، منقبض

**coarctation** /ˌkəʊˈɑːkˈteɪʃn/ *noun*
1 تەنگی، تەسکی، پەساوی، پەستێنراوی 2 تەنگی نێولەش ◌ 1 ضیق، فشردگی 2 تنگی مهبل

**coarse** /kɔːs, US kɔːrs/ *adjective* (coarser, coarsest)
1 زبرە، زبر، زوور، ئاژین، درشت، گزم، زیق، گرناڵ، گرنجاوی، گەرووز، نەلووس 2 ناشیرین، ناحەز، عەیب، جلف، هەرزە، بێ‌ماریفەت، بێ‌ڕەوشت، بێ‌ڕەوشتانە 3 توند، توندوتیژ 4 ناخۆش ◌ 1 زمخت، درشت، زبر 2 زشت، بی‌ادب، بی‌ادبانه 3 خشن 4 نامطبوع

**coarse fish** *noun, pl.* same
(بریتانیا) کۆرس‌فیش (هەر ماسییێ بێجگەلە salmon و trout، پروانە game fish) ◌ کورس فیش

**coarse fishing** *noun*
وەرزش یان سەرگەرمی ڕاوەماسی ◌ ورزش ماهی‌گیری

**coarsely** /kɔːsli, US kɔːrsli/ *adverb*
بێ‌ڕەوشتانە: *He laughed coarsely at her* ◌

بی‌ادبانە
**coarseness** /kɔ:snəs, US kɔ:rsnəs/ *noun*
بێ‌تۆرەیی، بێ‌رەوشتی، بێ‌ماریفەتی ◌ بی‌نزاکتی
**coast** /kəʊst, US koʊst/ *noun, adjective*
*n* 1 کەنار، پەڕ، رەخ، گوێ‌ئاو، دەم‌ئاو، پاڵ‌ئاو 2 کەناری دەریا، زرێبار، زەریاپەڕ *adj* کەناری ◌ *n* 1 ساحل 2 کنار دریا *adj* ساحلی
**coastal** /'kəʊstl, US 'koʊstl/ *adjective*
کـــــەناری، ســــــەربە رۆخ: *coastal waters/resorts/scenery* ◌ ساحلی
**coaster** /'kəʊstə(r), US 'koʊst-/ *noun*
1 کەشتی کەنارڕەو یان کەنارگەڕ 2 ژێرلیوان، کەشەفی چکۆلانە 3 (ئەمریکا) تاخورک یان خێشکی سووک و درێژ 4 = roller coaster ◌ 1 کشتی ساحل‌پیما 2 زیرلیوانی 3 لوژ
**coastguard** /'kəʊstgɑ:d, US 'koʊstgɑ:rd/ *noun*
1 کەنارەوان، کەنارپارێز، پارێزەوان یان گاردی کەناری 2 ئەندامی کەنارپارێزان ◌ 1 گارد ساحلی 2 عضو گارد ساحلی
**coastguardman** *noun, pl.* coastguardmen
ئەندامی کەنارپارێزان ◌ عضو گارد ساحلی
**coastland** *noun*
کەنارستان (بەرین و لەپاڵ دەریادا) ◌ کوست‌لند
**coastline** /'kəʊstlaɪn, US 'koʊst-/ *noun*
هێڵی کەناری ◌ خط ساحلی
**coast plain** *noun*
دەشتی کەناری ◌ دشت ساحلی
**coastward** *adverb*, also coastwards
بەرەو کەنار ◌ به سوی ساحل
**coat** /kəʊt, US koʊt/ *noun*
1 باڵتە، چاکەت، کەوا، باڵتە، پاڵتۆ: *to put on/take off your coat* ◊ *a long winter coat* 2 موو، قژ، تووک، تیسک، بەرگم، خوری: *a dog with a smooth/shaggy coat* 3 چین، توێ، کۆڵ، گەردال، توێژاڵ: *to give the walls a second coat of paint* 4 رووکێش، رووپۆش، بەرگ(ە) ◌ 1 پالتو، کت 2 پشم، مو 3 لایە 4 روکش
**coat check** = cloakroom
**coat-hanger** = hanger
**coati** /kəʊ'ɑ:ti/ *noun, pl.* coatis
کواتی: گیانەوەرێکی راکوون‌ئاسا، لە ئەمریکای باشووری و ناوەندی‌دا دەبینرێ [توخمەکانی *Nasua* و *Nasuella*: سێ یان چوار جۆرن] ◌ کواتی
**coatimundi** /kəʊˌɑ:tɪ'mʌndi/ = coati
**coating** /'kəʊtɪŋ, US 'koʊt-/ *noun*
1 توێ، تۆ، گەردال، توێژاڵ، توێی دەرەوە: *a thin coating of chocolate* 2 سەرپۆشک، رووپۆشین، رووکەش، بەرگ، رووکێش ◌ 1 لایە، لایەی خارجی 2 پوشش، روکش
**coat of arms** *noun, pl.* coats of arms or arms
نیشانە، درف، دروشم، دروشم یان نیشانەی لەشکری و خێزانە کۆنەکان، هەر چەشنە دروشمێکی حکومەت، خێزان یان شتی وا: *the royal coat of arms* (بنەڕەت: *cote of armes* وەرگیرانی *cote d'armes*، Middle English (Middle French ◌ آرم
**coat of mail** *noun*
(مێژوویی) زرێ، گەوچن؟ ◌ جوشن، زره
**coatroom** /'kəʊtru:m, -rʊm, US 'koʊt-/ *noun*, also cloakroom
ژووری لە خانووی گشتی کە خەڵک دەتوانن جانتا و باڵتەکانیان بۆ ماوەیەن بەجێ‌بێڵن، checkroom ،cloakroom ◌ کوت‌روم
**coat-tails** *noun, pl.*
پشتی کۆت، پشتەوەی کۆت ◌ دم کت
**co-author** *noun*
هاونووسەر، هاودانەر، نووسەری هاوبەش ◌ نویسندەی مشترک
**co-authorship** *noun*
هاونووسەریتی، نووسەرایەتی هاوبەش، هاونووسەری ◌ نویسندگی مشترک
**coax** /'kəʊaks/ *noun*
(تافەرمی) کابلی هاوتەوەر ◌ کابل هم‌محور
**coaxial** /kəʊ'aksɪəl/ *adjective*, also coaxal /'kəʊaksl/
یەک‌تەوەر(ە)، هاتەوەر(ە) ◌ هم‌محور
**coaxing** /'kəʊksɪŋ, US 'koʊ-/ *noun, adjective*
زمانچەوری، زمانلووسی، نازونیاز، بەدەوراهاتن: *No amount of -ng will make me change my mind* ◌ چرب‌زبانی، چاپلوسی
**coaxingly** /'kəʊksɪŋli, US 'koʊ-/ *adverb*
زمانلووسانە، بە زمانلووسی(یەوە) ◌ چاپلوسانه
**cob**[1] /kɒb, US kɑ:b/ *noun*
1 قازی نێر، قووی نێر 2 ئەسپی پێکوڵ 3 نانی خڕ: *a crusty cob* 4 فندق 5 ساقەت یان لاسکی گەنمەشامی: *corn on the cob* ◌ 1 قوی نر 2 اسب پاکوتاه 3 نان گرد 4 فندق 5 چوب ذرت
**cob**[2] /kɒb, US kɑ:b/ *noun*
(لە بریتانیا) کاوگڵ (و جاران بۆ دروستکردنی دیوار) ◌ کاه‌گل
**cobalamin** /kɔ(ʊ)'baləmɪn/ *noun*, also vitamin $b_{12}$
(زیندەکیمیا) کۆبالامین (بنەڕەت: تێکەڵەی (vitamin + cobalt ◌ کوبالامین
**cobalt** /'kəʊbɔ:lt, US 'koʊ-/ *noun*
1 کۆباڵت (بە ژ.گ. 27، ن. Co) 2 (هەروەها cobalt blue) شینی کۆباڵتی، شینی تۆخ ◌ 1

کبالت 2 آبی لاجوردی
**cobaltic** /kə(ʊ)'bɔ:ltɪk, US -'bɒlt-/ *adjective*, also cobaltous /kə(ʊ)'bɔ:ltəs, US -'bɒlt-/
کۆبالتی، سەربە کۆبالت ◌ وابسته به کوبالت
**cobalt violet** *noun*
بنەوشی تۆخ، بنەوشی توند ◌ بنفش تیره
**cobber** /'kɒbə(r), US 'kɑ:b-/ *noun*
دۆستی من، براکەم، کاکە، هەوال (ب.ت. بۆ پرسینی ناونیشان) ◌ رفیق
**cobble** /'kɒbl/ *noun*
خرکەبەرد، کووچ، خلک ◌ قلوەسنگ
**cobbled** /'kɒbld, US 'kɑ:bld/ *adjective*
خرکەرێژ(کراو، شەقام و ڕێگاکان) ◌ فرش‌شده با قلوەسنگ
**cobbler** /'kɒblə(r), US 'kɑ:b-/ *noun*
1 پینەچی، کەوش‌دروو، پێلاودروو، مشەقە (cobbler's knife = چەقۆ یان گوێزانی پینەچی، ئەسکەنە) 2 جۆرێ خواردنەوەی بەستوو، لە مەی یان شیری، شەکر و لیمۆترش دروست دەکرێ 3 کابلێر (جۆرێ میوە) 4 (cobblers بریتانیا و نافەرمی) گەڵوگون 5 هەلیت‌وپلیت، شڕوبڕم، حەلەق‌ومەلەق ◌ 1 پینەدوز 2 و 3 کابلر 4 بیضه‌های مرد 5 چرندیات
**cobblestone** /'kɒblstəʊn, US 'kɑ:blstoʊn/ *noun*
خرکەبەرد، کووچ، خلک، خەرسەک، کەلووچ، کەمەرە (cobblestoned *adj*) ◌ قلوەسنگ
**co-belligerence** *noun*
هاوبەشداری لە شەڕدا لەگەڵ دوژمنێکی هاوبەش ◌ کوبلیجرنسی
**co-belligerent** *adjective*
هەریەک لە دوو یان چەند وڵاتێ کە کەوتوونەتە شەڕ لەگەڵ دوژمنێکی هاوبەش ◌ کوبلیجرنت
**cobia** /'kəʊbɪə/ *noun*, *pl.* same
جۆرێ ماسی گەورەی خۆراکی [*Rachycentron canadum*] ◌ کوبیا
**coble** /'kəʊb(ə)l/ *noun*
جۆرێ گەمی بن‌پان بۆ ڕاوەماسی لە سکاتلەند و باکووری ڕۆژهەڵاتی ئینگلتەرە ◌ کوبل
**COBOL** /'kəʊbɒl, US 'koʊbɔ:l/ *noun*, Cobol (Common bussiness-oriented language
زمانی کوبال (= جۆرێ زمانی بەرنامەدانانی کامپیوتێری) ◌ کوبول
**cobnut** *noun*
فندق، بەری فندقی ئەورووپایی [*Corylus avellana grandis*]؛ هەروەها: ئەو رووەکەی کە ئەم بەر و میوەیە دەگرێ ◌ فندق
**cobra** /'kəʊbrə, US 'koʊ-/ *noun*
ماری کوبرا (لە هیندووستان و ئەفریکا دەژی [*Naja naja* (هی spetacled)، *N. haje* (هی) میسر) و جۆرەکانی تر]) ◌ مار کبرا
**cobweb** /'kɒbweb, US 'kɑ:b-/ *noun*
1 داوی جالجالۆوکە، تەڤنۆک، تەونە جالجالۆوکە 2 شتی ڕزیو ◌ 1 تار عنکبوت 2 چیز گندیده
**cobwebbed** /'kɒbwebd, US 'kɑ:b-/ *adjective*
داوی جالجالۆوکەداگرتوو، تەوناوی: *cobwebbed corners* ◌ تار عنکبوت‌گرفته
**cobwebby** *adjective*
داوی جالجالۆوکەئاسا، تەوناسا ◌ تار عنکبوت‌مانند
**coca** /'kəʊkə/ *noun*
1 جۆرێ دەوەنی ئەمریکای ئەمریکا، لەبەر گەڵاکانی دەکرێ، چونکو سەرچاوەی کۆکاینە [*Erythroxylum coca*] 2 گەڵای وشکەوەبووی ئەو دەوەنە، لەگەڵ لیمۆترش تێکەڵ دەکرێ و وەک هاندەرێ لە لایەن گەلانی ڕەسەنی ڕۆژاوای ئەمریکای باشووری دەجاورێ ◌ کاکائو
**Coca-Cola** /ˌkəʊkə 'kəʊlə, US ˌkoʊkə 'koʊlə/ *noun*
1 کۆکاکۆلا 2 شووشەی کۆکاکۆلا ◌ 1 کوکاکولا 2 شیشه‌ی کوکاکولا
**cocaine** /kəʊ'keɪn, US koʊ-/ *noun*, also cocain
ئالکالۆیدێکی کریستالی تاڵ $C_{17}H_{21}NO_4$، لە (گەڵاکانی) کۆکا دەگیرێ و وەک ماکێکی هاندەری ناقانوونی بەکاردێترێ ◌ کوکائین
**cocainism** *noun*
کۆکاینیزم، ژاراوی‌بوون بە کۆکائین ◌ کوکاینیسم
**cocainization** *noun*
سڕاندن یان بێ‌هۆش‌کردن بە کۆکائین ◌ بی‌حس‌سازی با کوکائین
**coccid** *noun*
مێرووێکی پوولەکەداری سەربە زوورخێزانی Coccoidea ◌ کوکسید
**coccidia** /kɒk'sɪdɪə/ *noun*, *pl.*, *sing.* coccidium
سەرەتاژیاوە protozoansمشەخۆرەکانی کۆمەڵێ کە بەرپرسی نەخۆشی toxoplasmosis و هی ترە [ژێردەستە Eimeriorina] ◌ کوکسیدیا
**coccidioidomycosis** /kɒkˌsɪdɪˌɔɪdəʊmaɪ'kəʊsɪs/ *noun*, also desert fever
تای بیابان، جۆرێ نەخۆشی فۆنگالی (بە هۆی کارگ یان کەڕووی *Coccidioides immitis*) ئاستەمی سی و شانەکانی تر، هی ناوچە وشک و نیمچەگەرمەکانی ئەمریکا ◌ کوکسیدیوایدیومیکوز
**coccidiosis** *noun*, *pl.* coccidioses
جۆرێ نەخۆشی باڵندە یان ئاژەڵە ماڵی‌یەکان کە بەهۆی sporozoanی مشەخۆری دەستەی

Coccidia تووش دەبن ۞ کوکسیدیوز

**coccoid** *adjective,* also coccoidal

1 بە شێوەی خانەی خڕ یان خڕخانە، شێوە coccus، پێوەند یان سەربە coccus 2 خڕ، گۆیی، globular ۞ 1 گوییزەمانند 2 گرد، کروی

**coccolith** /'kɒkəlɪθ/ *noun*

توویەردینە: جۆرێ ئالقە یان پەپکەی گەچی یان کلسی مایکرۆسکۆپی کە بەشێ لە قاوخی هێندێ پلانکتۆنی دەریایی پێکدێنن و نیوەرۆکی زۆریک لە بەردەگەچەکان دادەڕێژن (coccolithic *adj*) ۞ کوکولیت

**coccolithophore** /ˌkɒkə(ʊ)'lɪθəfɔː/ *noun*

(زیندەناسی) جۆرێ شێلاقداری flagellate پلانتکتۆنیکی تاکخانەیی [دەستە Coccolithophorida] ۞ کوکولیتوفور

**coccus** /'kɒkəs/ *noun, pl.* cocci /'kɒk(s)ʌɪ, US 'kɒk(s)iː/

(بەکتریاناسی) بەکتریای خڕ spherical، خڕخانە (coccal *adj*) ۞ گوییزە

**-coccus** *suffix, pl.* -cocci

پاشگر: خڕ، گروڤەر، زیندەوەر یان میکرۆئۆرگانیزمێکی تووئاسا: *micrococcus* (بنەڕەت: لە *kokkos* یۆنانی "berry") ۞ پسوند: گرد، مدور

**coccygeal** /kɒk'sɪdʒɪəl/ *adjective*

کلکەیی، کلێنچکەیی، قنۆڕگی، جوچکەیی، سەربە کلکە یان کلێنچکە ۞ وابستە بە دنبالچە

**coccyx** /'kɒksɪks, US 'kɑːk-/ *noun, pl.* coccyges /-ɪdʒiːz/ or coccyxes

(توێکاری) ئێسکی کلێنچکە، مازگا، قلێنچە، تەری، نێک، جوچکە، کنگەجووڕە، کلک(ە)، قنۆڕگ، کلیژی، کلیژ (لە مرۆڤدا 4 تا 5 دانەیە؛ بنەڕەت: بە ڕێگای لاتین لە *kokkux* یۆنانییەوە "کۆترەبەپوو cuckoo"، چونکو ئەو ئێسکە شێوەی دەنووکی کۆترەبەپوو دەدا) ۞ استخوان دنبالچە

**Cochin** *noun,* also Cochin Chin

کۆچین: جۆرێ نژادی ئاسیایی جووجەی خۆماڵی، بە کلک و باڵی چکۆلە و پەڕوباڵ پڕ ۞ کوچین

**cochineal** /ˌkɒtʃɪ'niːl, US 'kɑːtʃəniːl/ *noun*

1 سوورینە، قرمز، کاچینیل 2 (cochineal insect) جۆرێ مێرووی کاکتوسخۆری سووری ورد کە مێینەی ئەمانە سەرچاوەی سوورینەن [*Dactylopius coccus*] ۞ 1 قرمزدانە 2 نوعی حشرە

**cochlea** /kɒklɪə, US 'koʊk-, 'kɑːk-/ *noun, pl.* cochleae /-klɪiː/

1 پێچپێچۆکە 2 پێچپێچۆکەی گوێ 3 پلیکانی پێچەڵاوپێچ (cochlear *adj*: *cochlear implant*) ۞ 1 حلزون 2 حلزون گوش 3 پلکان برپیچ و خم

**cochleate** /'kɒklɪɪt, US -leɪt/ *adjective,* also cochleated

پێچپێچۆکەیی، پێچلوولی ۞ حلزونی

**cock**[1] /kɒk, US kɑːk/ *noun*

1 کەڵەشێر، کەڵەباب، کووک 2 نێر، جوڕە- (لە لێکدانا) 3 شێرە (ئا و هتد) 4 چەخماخە، چەکوش (تفەنگ) 5 ئامادەی تەقاندنەوە، دۆخی سوارکراو 6 هەڵێتوپلێت، حەلەقومەلەق 7 (نافەرمی) ڕووداری، ڕووهەڵماڵراوی 8 براکەم، کاکە (بۆ پرسینی ناونیشان) 9 (نافەرمی) کیر، کێر، چووک 10 پێشەوا، سەرۆک، سەرگەورە، سەردەستە 11 لاردانان (وەکوو کڵاو) ۞ 1 خروس 2 نر (در ترکیب) 3 شیر 4 ضارب 5 وضعیت مسلح تفنگ 6 دری وری 7 پررویی 8 رفیق 9 کیر 10 رئیس 11 کج‌گذاری

**cock**[2] /kɒk, US kɑːk/ *noun*

کۆما، کۆگا، لۆدە ۞ کپە، تودە

**cockabully** /'kɒkəbʊli/ *noun, pl.* cockabullies

(نیوزیلەند) جۆرێ ماسی ئاوی شیرین، پێوەندی بە sleeperەکانەوە هەیە [تۆخم *Gobiomorphus*] ۞ نوعی ماهی

**cockade** /kɒ'keɪd/ *noun*

نیشانی کڵاو، گوڵی کڵاو، باریکەی کڵاو (cockaded *adj*) ۞ کوکاد

**cock-a-doodle-doo** /ˌkɒk ə ˌduːdl 'duː, US ˌkɑːk/ *interjection*

قووقە یان خوێندنی کەڵەشێر ۞ قوقولی قوقو

**cock-a-hoop** *adjective,* be cock-a-hoop

شاگەشکە، یەکجارووڕوژاو، زۆر بەکەیف، یەکجار لەشەوق، یەکجار بەگوڕ، ترێلان ترێلان هاتن ۞ بسیار خوشحال و هیجان‌زدە

**cock-a-leekie** *noun*

سوپێکی سکاتلەندی، جووجە و کەوەری تیایە ۞ نوعی سوپ

**cockalorum** /ˌkɒkə'lɔːrəm/ *noun, pl.* cockalorums

مرۆی خۆهەڵکێش ۞ آدم خودستا

**cockamamie** /'kɒkəmeɪmi, US 'kɑːk-/ *adjective,* also cockamamy

(ئەمریکا(ی باکووری) و نافەرمی) گەوجانە، کەرانە ۞ احمقانە

**cock-and-bull story** *noun*

(نافەرمی) چیرۆک یان داستانی بەرکوورە یان باوەڕپێنەکراو، چیرۆکی لە ڕاستی‌بەدوور، ئاسمان و ڕیسمان، نەزیلە ۞ قصەی کلثوم ننە

**cockatiel** /ˌkɒkə'tiːl, US ˌkɑːk-/ *noun*

تووتی ئەوسترالیایی [*Nymphicus hollandicus*] ۞ کوکاتیل

**cockatoo** /ˌkɒkəˈtuː, US ˈkɑːkətuː/ *noun*, *pl.* cockatoos
تـــووتی پۆپنـــه، تـــووتی پۆپـــه‌دار [خێـــزان Cacatuidae: گەلێ جۆرن] ◌ طوطی کاکل‌دار

**cockatrice** *noun*
شـامار، هەژدیهایـەکی ئەفسانەیی کـه بـه چـاو لێ‌کردنی مرۆڤ دەمری (بنەرەت: لە *cocatris* فەرەنسی کۆن، لە *calcatrix* لاتین "tracker"، وەرگێــردراوی *ikhneumōn* یۆنــانی (بڕوانــه ichneumon) ◌ کوکاترایس

**cockboat** /ˈkɒkbəʊt/ *noun*
جۆرێ بەلەمی چکۆلەی سەوڵدارە ◌ کوکبوت

**cockchafer** /ˈkɒktʃeɪfə(r), US ˈkɑːk-/ *noun*
(گیانەوەرناسی) قالۆنچەی قاوەیی، کێزارەش: جۆرێ قالۆنچەی قاوەیی شێوانفڕ dusk-flying کـه میمـلێکی مـاڵویـرانکـەری گژوگیایـه [*Melolontha melolontha*] ◌ سوسک طلایی

**cockcrow** /ˈkɒkkrəʊ, US ˈkɑːkkroʊ/ *noun*
کەرەبـــەیانی، کەڵەشـــێرخوێنان، شـــەبەق، مەلابانگدان ◌ سحر

**cocked hat** *noun*
کلاوی لێوار هەڵگەڕاو ◌ کلاه سه‌گوش

**cocker** /ˈkɒkə(r), US ˈkɑːk-/ *noun*
کوکێر، سەگی سپانیێل spaniel ◌ کوکر

**cockerel** /ˈkɒkərəl, US ˈkɑːk-/ *noun*
بەچکەکەڵەشێر، بارِ، فڕو(و)ج ◌ جوجه‌خروس

**cocker** = spaniel cocker

**cock-eyed** /ˈkɒkaɪd, US ˈkɑːk-/ *adjective*
(نافــەرمــی) 1 خێــل، چــاولار absurd = 2، impractical ◌ لوچ

**cockfight** /ˈkɒkfaɪt, US ˈkɑːk-/ *noun*
شەرەکەڵەشێر، شەرەکەڵەباب ◌ جنگ خروس

**cockfighting** /ˈkɒkfaɪtɪŋ/ *noun*
1 شەرەکەڵەشێر 2 کەڵەشێری شەڕکەر یان شەڕانی، کەڵەشێری لاری ◌ 1 جنگ خروس 2 خروس جنگی

**cockle** /ˈkɒkl, US ˈkɑːkl/ *noun*
1 سەدەف (خۆراکی)، لەپکە، گوێماسی، جۆرێ mollusc دوولەپکەی ڕەهۆڵێندەری خۆراکی بـه قـاوخ یـان لـەپکـەی ڕێڕێـوە [تـوخم *Cardium*] 2 قوفە، بەلەم ◌ 1 صدف خوراکی، صدف 2 کرجی، زورق

**cocklebur** *noun*
جۆرێ گیا لە تیرەی daisy، بە گەڵای پانەوە، ڕەسـەنی گـەرمێنانی ئـەمریکا [ *Xanthium strumarium*] ◌ نوعی گیاه

**cocklefish** *noun*, *pl.* same or cocklefishes
گوێماسی، گوێچکەماسی ◌ صدف

**cockleshell** /ˈkɒklʃel, US ˈkɑːkl-/ *noun*
1 سەدەف، گوێچکەماسی 2 قوفە، بەلەم، گەمی ◌ 1 صدف 2 کرجی

**cockney** /ˈkɒkni, US ˈkɑːkni/ *noun*, *adjective*, *pl.* cockneys
*n* کاکنی (دانیشتووی بەشی ڕۆژهەڵاتی لەندەن)، زاراوەی کاکنی *adj* سەربە کاکنی ◌ *n* کـاکنی، لهجه‌ی کاکنی *adj* وابسته به کاکنی

**cock-of-the-rock** *noun*, *pl.* cocks-of-the-rock
جۆرێ cotinga پۆپنەی دارستانە گەرمێنەکانی ئەمریکای باشووری، نێرەکەی پەروباڵێکی سوور یان پرتەقاڵی ورشنی هەیە [توخم *Rupicola*: دوو جۆرن] ◌ نوعی پرنده

**cockpit** /ˈkɒkpɪt, US ˈkɑːk-/ *noun*
1 کـابین، ژووری فڕۆکـەوان، ژووری دەسـتەی فڕۆکـەوانی یـان کەشـتی ئاسـمـانی 2 جێگـای شۆفێر (ماشێنی پێشبڕکێ) 3 چاڵ یان شوێنی شەرەکەڵەشێر (جاران) 4 مەیدان یا گۆرەپانی شەڕ، شەرگە، قاداشەڕ ◌ 1 کابین، کابین خدمه‌ی هواپیما یا سفینه‌ی فضایی 2 جایگاه راننده 3 مکـان جنگ خروس‌ها 4 عرصه‌ی کارزار

**cockroach** /ˈkɒkrəʊtʃ, US ˈkɑːkroʊtʃ/ *noun*
(گیانەوەرناسی) بەرسوورکە، سیسرک، سفرەبرە، قالۆنچە، قزقانج [*Blatta orientalis* و جۆرەکانی تر، ژێردەستە Blattodea] ◌ سوسک

**cockscomb** /ˈkɒkskəʊmb/ *noun*
1 پۆپە، پۆپکە، پۆپنە، کاتار، کـاتۆر، کۆپتـه، سووراو، شەهـ نیشـان، یاڵ، کاکۆڵی کەڵەشێر 2 پۆپەکەڵەشـێرە، بـادروو، گـوڵمـەخموور، گوڵـەقەیفە، سـەوڵ [*Celosia cristata*] 3 جـۆرێ گیاسـارمەی orchid ڕەنگـینی ڕۆشـن، پێوەندی بە coralroot ـەکانەوە هەیە، ڕەسـەنی باشـووری ئـەمریکـای بـاکووری [تـوخم *Hexalectris*] ◌ 1 تاج خروس 2 تـاج‌خـروس (گیاه) 3 نوعی گیاه

**cock's eye** *noun*
(ڕووەکناسی) چاوی کەڵەشێر، چاوەکەڵەشێرە ◌ نوعی گیاهی

**cocksfoot** *noun*
پێیکەڵـەشێرە؟، جـۆرێ گیـای گـەڵاپـان، بـه هێشـووەگوڵـی ئـەرخـەوانی یـان سـەوزەوە [*Dactylis glomerata*] ◌ نوعی گیاهی

**cockshy** /ˈkɒkʃaɪ/ *noun*, *pl.* cockshies
نیشـان، ئامانجی داری یان بەردین ◌ نشان

**cockspur** /ˈkɒkspɜː(r)/ *noun*
چووە، مامزە، چقە، چق ◌ سیخک پای خروس

**cockspur thorn** *noun*
(ڕووەکناسی) دڕووەچـووە؟: جـۆرێ گێـوژێ hawthorn ئەمریکای باکووری [ *Crataegus crus-galli*] ◌ نوعی ولیک

**cocksure** /ˌkɒk'ʃʊə(r), -ʃɔ:(r), US ˌkɑ:k'ʃʊr/ *adjective*
(نافــەرمی) دڵــنیا، لــەخۆڕازی، لــەخۆبــایی، خاترجەم (*cocksurely adv*؛ cocksureness *n*) ◌ مطمئن

**cocktail** /'kɒkteɪl, US 'kɑ:k-/ *noun*
1 بــەرکوڵ 2 پــێش‌خــوراک 3 تێکەڵــە 4 نیمچەفەرمی 5 ئەسپی کوڵ یا قوڵ ◌ 1 کوکتـل 2 پیش‌غذا 3 مخلوط 4 شبەرسمی 5 اسب دم‌کل

**cocktail dress** *noun*
جل‌وبەرگی میوانی یان فەرمی، بەرگی فەرمی، جلی میوانی یان دیوانی ◌ لباس رسمی

**cocktail party** *noun*
میوانی کوکتێل ◌ مهمانی کوکتل

**cock-up** *noun*
(بریتانیا و نافەرمی) تێریان، گووکاری ◌ افتضاح

**cocky**[1] /'kɒki, US 'kɑ:ki/ *adjective* (cockier, cockiest)
1 زۆوردڵنیا، تەواو خاترجەم: *a cocky young actor* 2 لــەخۆبایی 3 = jaunty ( cockily /'kɒkɪli, US 'kɑ:kɪli/ *adv*: لەخۆباییانە، فیزنانە، لە رووی خۆبەزلزانییەوە؛ cockiness /'kɒkinəs, US 'kɑ:kinəs/ *n*: خۆبەزلزانی، فیزنی، بەدەماری) ◌ 1 مطمئن 2 مغرور

**cocky**[2] = cockatoo

**coco** = coconut palm

**cocoa** /'kəʊkəʊ, US 'koʊkoʊ/ *noun, adjective*
*n* 1 کاکائۆ 2 هاڕاوەی کاکائۆ 3 دار کاکائۆ 4 شیر کاکائۆ 5 ئارەق یان خواردنەوەی کاکائۆ 6 پیاڵەی کاکائۆ *adj* قاوەیی ئاماڵ‌زەرد، قاوەیی کاڵ یان ڕۆشن ◌ *n* 1 کاکائو 2 پودر کاکائو 3 درخت کاکائو 4 شیر کاکائو 5 مشروب کاکائو 6 فنجان کاکائو *adj* قهوه‌ای مایل به زرد

**cocoa bean** *noun*
دەنک یان تووی کاکائۆ ◌ دانه‌ی کاکائو

**cocoanut** = coconut

**cocobolo** /ˌkəʊkə(ʊ)'bəʊləʊ/ *noun, pl.* cocobolos
کۆکۆبۆلۆ: درەختێکی گەرمێنانی ئەمریکا بە دارێکی سووربــاوی ســەختەوە [*Dalbergia retusa*] ◌ کوکوبولو

**coco de mer** /ˌkəʊkəʊdə'mɛː/ *noun*
جۆرێ دارخورمای بەرز یان درێژ. ڕەسەنی Seychelles، بەرێکی کەتەی هەیە کە لە نێو قــاوغ یــان قــاپێلکێکی دارینی ڕەق دایـــە [*Lodoicea maldivica*] ◌ نوعی درخت

**coconut** /'kəʊkənʌt, US 'koʊ-/ *noun*
1 گوێزهێند، گوێزەڕەش، نارگیل 2 درەخت یان داری گوێزهێند یان نارگیل [*Cocos nucifera*] ◌ 1 نارگیل 2 درخت نارگیل

**coconut butter** *noun*
کەرەی گوێزهێند یان نارگیل ◌ کره‌ی نارگیل

**coconut matting** *noun*
حەسیری تونکڵی گوێزهێند یان نارگیل ◌ حصیر پوست نارگیل

**coconut milk** *noun*
شیری گوێزهێند یان نارگیل ◌ شیر نارگیل

**coconut oil** *noun*
ڕۆنی گوێزهێند یان نارگیل ◌ روغن نارگیل

**coconut palm** *noun*
دارگوێزهێند، کەشکۆڵ؟، داری نارگیل، بە درێژایی کەنارە گەرمێنەکان شین دەبێ [*Cocos nucifera*] ◌ درخت نارگیل

**coconut shoy** *noun*
تۆپ‌خستن، هاویشتنی تۆپ (لە فانفاردا) ◌ پرتاب توپ

**cocoon** /kə'ku:n/ *noun*
1 قۆزاخە، کەلوو؟، ماشووت (ئاوریشم) 2 پاریزە، پەنا ◌ 1 پیله 2 حفاظ

**cocooned** *adjective*
تێوەپێچراو، پارێزراو ◌ محفوظ

**cocotion** *noun*
1 لێنان 2 هەرس، هەڵتاوان(دن) ◌ 1 طبخ 2 گوارش

**cocotte** /kɒ'kɒt/ *noun*
قاحیبە، سۆزانی، ژنی حیز ◌ روسپی، فاحشه

**cod**[1] /kɒd, US kɑ:d/ *noun, pl.* same, also codfish
کاد، کۆد، ماسی‌یەتوورەکە (شێوەی توورەکە دەدا)، جۆری ماسی دەریایی گەورە، گرنگە لەبەر گۆشتەکەی [*Gadus morhua*] (ئەتلانتیکی باکووری) و جۆرەکانی تر، خێزان [*Gadidae*] ◌ کاد

**cod**[2] /kɒd, US kɑ:d/ *noun*
1 (بریتانیا و نافەرمی) قسەی هیچەکە، فڵتە، یاوە 2 توورەکە، کیسە 3 بەرگی سۆس، تۆخی کەپەک ◌ 1 چرند، یاوه 2 کیسه 3 غلاف سبوس

**cod**[3] /kɒd, US kɑ:d/ *noun, adjective*
(بریتانیا و نافەرمی) *n* گاڵتە، نوکتە *adj* قەڵب، گزەتیاکراو، ساختە، هەڵبەستە، دەسکرد، زڕ، نارەسەن ◌ *n* جوک *adj* جعلی

**COD** /ˌsi: əʊ 'di:, US oʊ/ *abbreviation* cash on delivery
وەرگرتنی پارە کاتی پێدانی کەڵوپەل ◌ دریافت وجه هنگام تحویل کالا

**cada** /'kəʊdə, US 'koʊdə/ *noun*
(موسیقا) بەشی کۆتایی، پاشکە، دوابڕگە، پاشەکی ◌ نقطه‌ی پایانی

**code** /kəʊd, US koʊd/ *noun*
1 کۆد، پەرلە؟، یاسا و ڕێسا 2 ڕێ‌وشوێن، نەریت، دەستوور، عورف 3 هێما، ڕەمز، نیشانە 4

قانوون، زاگۆن، زاکوون، یاسا 5 (تەلەفون) کۆد 6 (کامپیوتێر) بەرنامە، دەستوورەکان، کۆمەڵە دەستوور ◌ 1 کد، ضوابط 2 عرف 3 رمز 4 قانون 5 (تلفن) کد 6 مجموعەی دستورالعمل

**code book** *noun*

کتێبی ڕەمز و نیشانە، نیشانەنامە ◌ کتاب رمز

**codec** /ˈkəʊdɛk/ *noun*

(ئێلیکترۆنیک) کۆدێک: وردەتەڵەزمەیێ microchip کە زانیارییەکان دەبەستێنێ تا زووتر ڕاگوێزرێ و دیسان فایلەکان و زانیارییەکان دەگەڕێنەوە باری خۆیان کە وەرگیران ◌ کودک

**coded** /ˈkəʊdɪd, US ˈkoʊ-/ *adjective*

1 ڕەمزی، نیشانەیی 2 ناڕاستەوخۆ (دەربڕاو)، شاراوە، سەرنراو ◌ 1 رمزی 2 تلویحی

**coded message** *noun*

پەیامی نیشانەیی یان ڕەمزی ◌ پیام رمزی

**codeine** /ˈkəʊdiːn, US ˈkoʊ-/ *noun*

(کیمیا) کۆدین $C_{18}H_{21}NO_3yH_2O$، لە مۆرفین دەگیرێ ◌ کودئین

**code name** *noun*

پەرلەناو، ناوی ڕەمزی ◌ اسم رمز

**code-named** *adjective*

خاوەنی ناوی ڕەمزی، پەرلەناودار ◌ دارای اسم رمزی

**code of practice** *noun*

ڕیساکانی کاری، بنچینەکانی کار یان پیشەیی، ستانداردەکانی کار ◌ ضوابط حرفەای

**code word** *noun*

نێوی ڕەمز، ڕەمز، نیشانە ◌ اسم رمز

**codex** /ˈkəʊdeks, US ˈkoʊ-/ *noun, pl.* codices /ˈkəʊdɪsiːz, US ˈkɒd-/ or codexes

1 دەس‌نووس (ب.ت. ئینجیل و دەقە کۆنەکان) 2 لیستی فەرمی دەرمان، مەتریاڵی کیمیایی و هتد ◌ 1 نسخەی خطی 2 کودکس

**codfish**, *pl.* same or codfishes = cod1

**codger** /ˈkɒdʒə(r), US ˈkɑːdʒ-/ *noun*

پیرەپیاوی سەیر و نیوزڕاو، کەلاکەکۆن، پیرەکۆن، کەرەکۆن ◌ پیرمرد عجیب و غریب و بدنام، کودگر

**codicil** /ˈkəʊdɪsɪl, US ˈkɑːdəsl/ *noun*

1 پاشکۆی ڕاسپاردەنامە، پاشکۆ یان سەرخستەی وەسیەت‌نامە 2 پاشکۆ، سەرخستە، appendix، supplement ◌ 1 متمم وصیت‌نامه 2 متمم

**codicilliary** /ˌkɒdɪˈsɪləri/ *adjective*

سەربە پاشکۆی ڕاسپاردەنامە ◌ وابسته به متمم وصیت‌نامه

**codicological** *adjective*

سەربە دەس‌نووس‌ناسی ◌ وابسته به کودیکولوژی

**codicologist** *noun*

دەس‌نووس‌ناس ◌ کودیکولوژیست

**codicology** /ˌkəʊdɪˈkɒlədʒi/ *noun*

دەس‌نووس‌ناسی: خوێندنەوە یان لێکۆڵینەوەی دەس‌نووسەکان manuscript و پێوەندییان لەگەڵ یەک‌تردا ◌ کودیکولوژی

**codification** /ˌkəʊdɪfɪˈkeɪʃn, US ˌkɑːd-/ *noun*

1 پەرلەدانان، کۆدانەدن، کۆددانان، ڕەمزدانان 2 دانان یان ڕێکخستنی قانوون ◌ 1 رمزگذاری 2 تدوین قانون

**codifier** *noun*

کۆدێنەر، کۆددانەر، پەرلەدانەر ◌ کدگذار

**codling**[1] *noun*

بەچکەماسی‌یەتوورەکە ◌ کودلینگ

**codling**[2] *noun*

جۆرێ سێوی درێژ و ورد ◌ کودلینگ

**codling moth** *noun*

جۆرێ پەپوولەی شەوگەڕی بۆرباوی چکۆلانە، کرمینەکانی لەسەر سێو دەخۆن [ *Cydia pomonella* ] ◌ نوعی پروانه

**cod-liver oil** *noun*

ڕۆنی جەرگ یان جگەری ماسی، ڕۆنی ماسی (ڤیتامینەکانی A و D تیایە) ◌ روغن کبد ماهی

**codomaim** /ˈkəʊdə(ʊ)meɪn/ *noun*

(بیرکاری) کۆدۆمەین: کۆمەڵەیێ کە هەموو نرخە ڕێتێچووەکانی فانکشنێکی دیاریکراوی تیایە ◌ کودومین

**codominance** *noun*

هاوزاڵی، هاودەرکەوتوویی ◌ کودومینانس

**codominant** *adjective*

هاوزاڵ، هاودەرکەوتوو ◌ کودومینانت

**codon** /ˈkəʊdɒn/ *noun*, also triplet

(زیندەکیمیا) کۆدۆن، سیانە: بەدوای‌یەک‌هاتنی سێ nucleotide کە پێکەوە یەکەیێکی کۆدی بۆماوەیی یان ژێنێتیکی لە DNA و گەردیکی RNA پێکدێنن (بڕوانە anticodon) ◌ کودون

**co-driver** *noun*

شاگرد، دواشۆفێر، ئاوەڵشۆفێر، شاگردشۆفێر ◌ رانندەی کمکی

**codswallop** /ˈkɒdzwɒləp, US ˈkɑːdzwɑːləp/ *noun*

(نافەرمی) یاوە، ژاوە، قسەی حەلەق‌ومەلەق ◌ مزخرف، چرند

**coecilian** = caecilian

**coed** /ˌkəʊˈed, US ˌkoʊ-/ *adjective, noun*

*adj* تێکەڵ (خوێندن) *n* خوێندکاری کچ ◌ *adj* مختلط *n* دانشجوی دختر

**coeducation** /ˌkəʊedʒʊˈkeɪʃn/ *noun*

خوێندنی تێکەڵ، هاوفێری، هاوپەروەردە (کچ و کوڕ) ◌ آموزش مختلط

**coeducational** *adjective*

تێکەڵ (خوێندنگا و پەروەردە) ◌ مختلط

**coecum** *noun*

ریخۆڵەکوێرە ⭘ اعور

**coefficient** /ˌkəʊɪˈfɪʃnt, US ˌkoʊ-/ *noun*
هاوکۆلکە، هاوکارا، هاوکاریگەر ⭘ ضریب

**coefficient of absorption** *noun*
هاوکۆلکەی مژین ⭘ ضریب جذب

**coefficient of elasticity** *noun*
هاوکۆلکەی جیری ⭘ ضریب کشش

**coefficient of expansion** *noun*
هاوکۆلکەی کشان ⭘ ضریب انبساط

**coefficient of friction** *noun*
هاوکۆلکەی لێکخشان ⭘ ضریب اصطکاک

**coefficient of reflection** *noun*
هاوکۆلکەی پەرچانەوە یان دانەوە ⭘ ضریب انعکاس

**coefficient of variation** *noun*
هاوکۆلکەی جۆراوجۆری ⭘ ضریب تنوع

**coelacanth** /ˈsiːləkanθ/ *noun*
جۆرێ ماسی، بربڕەبۆشە [*Latimeria chalumnae*] ⭘ نوعی ماهی

**Coelenterata** *noun, pl.*
(گیانەوەرناسی) ریخۆڵەبۆشەکان، بێهەناوان ⭘ سیلنتراتا

**coelenterate** /siːˈlɛnt(ə)rət, US -reɪt/ *noun*
گیانەوەری ریخۆڵەبۆشە، بێهەناو ⭘ سیلنترات

**coelenteron** *noun, pl.* coelentera
بۆشایی نێوەکی گیانەوەرێکی ریخۆڵەبۆشە ⭘ سیلنترون

**coeliac** /ˈsiːlɪak/ *adjective*, also celiac
(توێکاری و پزشکی) سەربە زگ، سکی، پێوەندی بە سکەوە هەیە ⭘ شکمی

**coeliac disease** *noun*, also celiac sprue
نەخۆشی زگی یان سکی ⭘ بیماری شکمی

**coelom** /ˈsiːləm/ *noun, pl.* coeloms or coelomata /-ˈləʊmətə/
(گیانەوەرناسی) گەورەبۆشایی لەشی زۆربەی گیانەوەران، لە نێوان کاناڵی ریخۆڵەیی و دیواری زگدا هەڵکەوتووە، بۆشایی زگ یان زگی، بۆشە(کە)، بۆشەک (بنەڕەت: لە *koilōma* یۆنانییەوە "cavity") ⭘ سیلوم

**coelomate** *adjective, noun*
(گیانەوەری) بۆشە(کە)دار ⭘ سیلومیت

**coelomic fluid** *noun*
شلەی بۆشە(کە)یی یان بۆشایی زگ ⭘ مایع سیلومی

**coelomic sac** *noun*
توورەکە یان کیسەی بۆشە(کە)یی یان بۆشایی زگ ⭘ کیسەی سیلومی

**coelomic** /səˈlɒmɪk/ *adjective*
بۆشە(کە)یی، سەربە بۆشە(کە)، بۆشەکی ⭘ وابستە بە سیلوم

**coelomocyte** *noun*
خانەی بۆشە(کە)یی یان بۆشەکی، خانەبۆشە(کە) ⭘ سلول سیلومی

**coelurosaur** /sɪˈljʊərəsɔː/ *noun*
مێلکەکلکبۆشە: جۆرێ دایناسۆری دووپێی گۆشتخۆر، لەوەدەچێ کە باڵندەکانی ئێستا لەوەوە پەرەیان سەندبێ (بنەڕەت: لە *koilos* یۆنانی "hollow" + *oura* "tail" + *sauros* "lizard") ⭘ سیلوسور

**coenobite** /ˈsiːnəbʌɪt/ *noun*, also cenobite
ئەندامێکی کۆمەڵی ڕەبەنەکان ⭘ سینوبایت

**coenobitic** /-ˈbɪtɪk/ *adjective*, also coenobitical
سەربە یان پێوەندی بە coenobite ەوە هەیە ⭘ وابستە بە سینوبایت

**coenocyte** /ˈsiːnəʊsʌɪt/ *noun*
(ڕووەکناسی) کۆمەڵێ سایتۆپلازمی قەوزەیی algal یان fungal کە چەندین نێوکیان هەیە، بە یەک پەردە داپۆشراون ⭘ سینوسایت

**coenocytic** /siːnəʊˈsɪtɪk/ *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە coenocyte ـەوە هەیە ⭘ وابستە بە سینوسایت

**coenzymatic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە coenzyme ەوە هەیە ⭘ وابستە بە کوانزیم

**coenzyme** /ˈkəʊˌɛnzʌɪm/ *noun*
(زیندەکیمیا) ئاوەڵهەوێنە، دواهەوێنە: ئاوێتەیێکی ناپرۆتئینی کە پێویستە بۆ کارکردنی هەوێنەیێ ⭘ کوانزیم

**coenzyme A** *noun*
دواهەوێنەی ئا، کۆئانزایم یان کۆئانزیمی A: کۆئانزایمی $C_{21}H_{36}N_7O_{16}P_3S$ کە لە هەموو خانە زیندووەکاندا هەیە و شتێکی بنەڕەتییە بۆ میتابۆلیزمی کاربۆهایدراتەکان، چەورییەکان و هێندێ لە ترشەڵۆکە ئەمینۆکان ⭘ کوانزیم A

**coenzyme Q** = ubiquinone

**coequal** /ˌkəʊˈiːkwəl/ *noun, adjective*
هاوپلە، هاوسان، هاوڕێژە، یەکسان، هاورادە، بەرامبەر، هاوتا، هاوشان (رادە و گرنگی): - *qual branches of government*
coequally /ˌkəʊˈiːkwəli/ *adv* ⭘ همشأن، همکفو

**coequality** /kəʊɪˈkwɒlɪti/ *noun*
هاوسانی، هاوشانی، هاوڕێژەیی، هاوپلەیی، هاورادەیی، بەرامبەری، هەڤبەری، هاوتایی، هاوپایەیی ⭘ همرتبگی

**coerced obidience** *noun*
گوێڕایەڵی زۆرەملی ⭘ اطاعت اجباری

**coercion** /kəʊˈɜːʃn, US koʊˈɜːrʒn/ *noun*
1 زۆرەملی، بەکارهێنانی زۆر، زۆربەسەندن، زۆرلێکردن، ناچارکردن، زۆری، گوشار، سەنگی: *He claimed he had only acted under*

حکومەتی زۆرداری یان دیکتاتۆری 2 coercion
1 اجبار، اعمال زور، زور 2 دولت خودکامه ◌

**coercive** /kəʊ'ɜːsɪv, US koʊ'ɜːrsɪv/ *adjective*
زۆردارانە، زۆرەملێیانە، زۆرەملێیانە، بە زۆر، سەرکوتکەرانە، زۆردارەکی: *coercive power*
coercively /koʊ'ɜːsɪvli, ) *-sive measures* ◊
coerciveness ؛US koʊ'ɜːrsɪvli/ *adv*
◌ (/koʊ'ɜːsɪvnəs, US koʊ'ɜːrsɪvnəs/ *n*
اجباری، مبنی بر اعمال فشار

**coessential** /ˌkəʊɪ'senʃəl/ *adjective*
هاوگەوهەر، هاوسروشت ◌ هم‌ذات

**coetaneous** = coeval

**coeternal** *adjective*
هاوبەش لە ئەزەلیەتدا، هاوهەتا(هەتا)یی ◌ کواترنال

**coeval** /kəʊ'iːvl, US koʊ-/ *adjective, noun*
هاوچەرخ، هاوسال، هاورۆژگار، هاوتەمەن،
coevally /kəʊ'iːvli, US ) contemporary
(koʊ-/ *adv* ◌ معاصر، هم‌سال

**coevality** /ˌkəʊɪ'væləti/ *noun*
هاوچەرخی، هاوسالی، هاورۆژگاری، هاوتەمەنی
◌ معاصر بودن، هم‌سالی

**coexistence** /ˌkəʊɪg'zɪstəns, US ˌkoʊ-/ *noun*
1 پێکەوەژینی، پێکەوەژیان: *to live in uneasy/peaceful coexistence within one nation* 2 پێکەوەژیانی ئاشتیخوازانە ◌ 1
هم‌زیستی 2 هم‌زیستی مسالمت‌آمیز

**coexistent** *adjective*
پێکەوەژی، پێکەوەژیاو، پێکەوەژیانکەر ◌
باهم‌زیست‌کننده

**coexistensive** *adjective*
پێکەوە لە کات و شوێنێکدا درێژەوەبوو ◌
باهم در یک زمان و یک مکان بسط‌یافته

**cofactor** *noun*
(زیندەکیمیا) هۆکاری یاریدەدەر (وەک (coenzyme ◌ عامل کمکی

**C of E** /ˌsiː əv 'iː/ *abbreviation* Church of England
کلێسەی ئینگلتەرە ◌ کلیسای انگلستان

**coffee** /'kɒfi, US 'kɔː-, 'kɑː-/ *noun, adjective*
*n* 1 قاوە 2 دەوەن یا داری قاوە [توخم *Coffea*: چەندین جۆرن] 3 دەنک یان تۆوی قاوە 4 پیالە قاوە، قاوەخۆری 5 دەوەنی قاوە *adj* قاوەیی (بنەڕەت: لە *kahveh* تورکی، لە *kahwa* عەرەبییەوە) ◌ *n* 1 قهوه 2 بوته یا درخت قهوه 3 دانه‌ی قهوه 4 فنجان قهوه 5 بته‌ی قهوه *adj* قهوه‌ای

**coffee bar** *noun*
قاوەخانە ◌ تریا

**coffee bean** *noun*
تۆوی قاوە ◌ دانه‌ی قهوه

**coffee break** *noun*
پشوو، وچان ◌ تنفس

**coffee cup** *noun*
پیالەی قاوەخواردن، قاوەخۆری ◌ فنجان قهوه‌خوری

**coffee grinder** *noun*
ئاشی قاوە، قاوار، دەزگای قاوەهاڕ ◌ آسیای قهوه

**coffee house** *noun*
قاوەخانە ◌ قهوه‌سرا

**coffee-mill** = coffee grinder

**coffee morning** *noun*
میوانی قاوە بۆ بەیانی ◌ مهمانی صبح

**coffee pot** *noun*
قۆری یان چادانی قاوە، قاوەدان، جەزوە ◌ قوری قهوه

**coffee shop** = coffee bar

**coffee table** *noun*
مێزی نزم (بۆ دانانی کۆفار، پیالە و هتد)، مێزی پیالە ◌ میز عسلی

**coffee table book** *noun*
کتێبی وێنەداری جوان (بەشکۆ) ◌ کتاب پرتصویر مجلل

**coffee tree** *noun*
1 داری قاوە 2 kentucky coffee tree ◌
درخت قهوه

**coffer** /'kɒfə(r), US 'kɔːf-, 'kɑːf-/ *noun*
1 سنووق، مجری، یەغدان 2 بەنداوی کاتی، لابەنداو 3 (coffers) خەزێنە، گەنجینە، سەرمایە، سامان: *The nation's coffers are empty* 4 دراونامە، بودجە ◌ 1 صندوق، صندوقچه 2 سد موقت 3 (در جمع) خزانه، موجودی 4 بودجه

**cofferdam** *noun*
بەنداوی کاتی، لابەنداو ◌ سد موقت

**coffin** /'kɒfɪn, US 'kɔːfɪn/ *noun*
دووداره، دارتەرم، لەزاگ، وەخم، داربەست، تابووت (ئەو سنووقە درێژ و باریکە کە لاشەی مرۆڤی تیا دەنێژرێ یان دەسووتێنرێ): *A procession of mourners slowly followed the coffin* ◌ تابوت

**coffin bone** *noun*, also pedal bone
دوایین ئێسکی سمی ئەسپ ◌ کافین بون

**coffle** /'kɒf(ə)l/ *noun*
کاروان، قەتار (coffle لە قافلەی عەرەبییەوە وەرگیراوە) ◌ قافله

**coffret** /'kɒfrɪt/ *noun*
دەفر یان جێگای چکۆلە، سنووقچە ◌ ظرف کوچکه صندوقچه

**cog**[1] /kɒg, US kɑːg/ *noun*

1 ددانە، برگە، گرنجە، زمانە، دەندە 2 موورچە، ددانە پەیچک، ددانە پێچکە (cogged *adj*) ◌ 1 دندە، دندانە 2 چرخ‌دندە

**cog²** /kɒg, US kɑːg/ *noun*
کەشتییەکی پانی سەدەکانی نێوەڕاستی پاش‌وپێش‌خڕ ◌ کوگ

**cogency** /ˈkəʊdʒənsi, US ˈkoʊ-/ *noun*
1 پێویستی 2 هێز و توانایی قایل‌کردن، بڕایی، بەبڕی، بەبڕشتی، پێ‌سەلمێنەری، یەکلایی‌کەرەوەیی، یەکلایی‌کەرەوەیێتی 3 بەڵگەهێنانەوەی بەهێز ◌ 1 ضرورت 2 قاطعیت 3 استدلال محکم

**cogent** /ˈkəʊdʒənt, US ˈkoʊ-/ *adjective*
یەکلایی‌کەرەوە، بڕێنەرەوە، بڕا، بەبڕشت، سەلمێنە، پێ‌سەلمێنەر، قایلکەر، پتەو، توکمە، بەهێز، بەبڕشت: *cogent* ◊ *cogent forces* *evidence* ‹cogently *adv*›: قایلکەرانە، بە شێوەیەکی بڕا ◌ قاطع، متقاعدکنندە، محکم

**cogitable** /ˈkɒdʒɪtəbəl/ *adjective*
شیاوی بیرکردنەوە، لێ‌دەرامێنەری، conceivable، thinkable ◌ قابل تفکر

**cogitation** /ˌkɒdʒɪˈteɪʃn, US ˌkɑːdʒ-/ *noun*
بیر(لێ)کردنەوە، هزرین، بیرۆکە، لێکۆڵینەوە، تێ‌رامان، قووڵ‌بوونەوە، meditation ◌ تفکر، اندیشە، تأمل

**cogitative** /ˈkɒdʒɪteɪtɪv/ *adjective*
1 سەربە cogitation 2 بیرکەرەوە، بیرا ◌ 1 وابستە بە cogitation 2 فکور

**cogitativeness** /ˈkɒdʒɪteɪtɪvnəs/ *noun*
هێز یان توانستی بیرکردنەوە ◌ قوەی تفکر

**cogitator** *noun*
بیرکەرەوە، بیریار، بیرمەند، بیروەر، هزرمەند ◌ فکور، تفکرکنندە

**cognac** /ˈkɒnjæk, US ˈkoʊn-/ *noun*
1 کونیاک، قونیاغ (لە ڕۆژاوای فەرەنسە، لە شاری Cognac)، کنیاک 2 شووشەی قونیاغ ◌ 1 کنیاک 2 شیشەی کنیاک

**cognate** /ˈkɒgneɪt, US ˈkɑːg-/ *adjective, noun*
1 *adj* هاوخێزان، هاورەگ، هاورەسەن، هاورەچەڵەک، هاوزا، هاوبنج، هاوژێدەر 2 پێوەندیدار، سەربە، پێوەبەند، بەستراو *n* 1 وشە یان زمانی هاورەچەڵەک 2 (ماف) خزمایەتی خوێنی یا پشتی ◌ *adj* 1 همخانوادە، هم‌ریشە 2 مربوط، وابستە *n* 1 لغت یا زبان هم‌ریشە 2 (حقوق) نسبت خونی

**cognition** /kɒgˈnɪʃn, US kɑːg-/ *noun*
ناسین، ناسیاری، هەستپێکردن، ئاگاکردن، پێزانین، (توانایی) تێگەیشتن، بۆدەرکەوتن، زانست، زانیاری: *child studies centring on theories of cognition* ‹cognitional *adj*› ◌ شناخت، درک

**cognitive** /ˈkɒgnətɪv, US ˈkɑːg-/ *adjective*
کاگنیتیڤ، ناسینەرانە، سەربە ناسیاری: *a cognitive psychology* ◊ *child's cognitive development* ‹cognitively /ˈkɒgnətɪvli, US ˈkɑːg-/ *adv*› ◌ شناختی

**cognitive ability** *noun*
توانست یان توانایی کاگنیتیڤ ◌ توانایی درک

**cognitive process** *noun*
ڕەوت یان پرۆسەی کاگنیتیڤ ◌ فرایند شناخت

**cognitive science** *noun*
زانستی کاگنیشین، ناسین‌ناسی؟، ناسیاری‌ناسی ◌ شناخت‌شناسی

**cognitive scientist** *noun*
زانستەوانی کاگنیشین، ناسین‌ناس؟، ناسیاری‌ناس ◌ شناخت‌شناس

**cognitivism** *noun*
کاگنیتیڤیزم، ناسین‌گەری، ناسیاری‌گەری ◌ شناخت‌گرایی

**cognitivist** *noun*
کاگنیتیڤیست، ناسین‌گەر، ناسیاری‌گەر ◌ شناخت‌گرا

**cognizable** /ˈkɒ(g)nɪzəb(ə)l/ *adjective*
لەناسین‌هاتوو، دەناسرێ، شیاوی کاگنیشین ◌ شناخت‌پذیر

**cognizance¹** /ˈkɒgnɪzəns, US ˈkɑːg-/ *noun*, also cognisance
1 ئاگاداری، ناسین، پێزانین، تێگەیشتن، هەستپێکردن، زانین، تێگەیشتن، زانست 2 نیشانەی تایبەتی ◌ 1 اطلاع، درک، شناخت، علم 2 علامت ویژە

**cognizance²** /ˈkɒgnɪzəns, US ˈkɑːg-/ *noun*, take cognizance of
لەبەرچاوگرتن، سەرنج‌پێدان: *In the light of the new evidence that the court can now take cognizance of, the case is dropped* ◌ مورد توجە قرار دادن

**cognizant** /ˈkɒgnɪzənt, US ˈkɑːg-/ *adjective*
ئاگادار، هایدار، فێر: *cognizant of the importance of the case* ◌ مطلع

**cognomen** /kɒgˈnəʊmən/ *noun, pl.* cognominia
سەرناو، ناودەرکردە، دوانێو، پاشناو ‹cognominal *adj*› ◌ لقب، نام خانوادگی

**cognoscente** *noun*
شارەزا، پسپۆڕ ◌ خبرە، متخصص

**cognoscenti** /ˌkɒnjəˈʃenti, US ˌkɑːn-/ *noun, pl.*
شارەزایان، پسپۆڕان ◌ خبرگان، متخصصان

**cognoscible** /kɑːg'nɑːsəbəl/ = cognizable

**cogon** *noun*
گیایێکی درێژ و دڕ، بۆ هەڵاش [*Imperata*l *cylindrica*] ◌ نوعی گیاه

**cogwheel** /'kɒgwiːl, US 'kɑːg-/ *noun*
زنجیرکێش، موورچە، چەرخدەندە، دادنەیەیچک، ڕەوڕەوە یان پێچکەی دداندار، چەرخی دداندار، دیشلی ◌ چرخدنده

**cohabitant** *noun*
هاوجێ، هاومال ◌ بغلخواب

**cohabitation** /ˌkəʊˌhæbɪ'teɪʃn, US ˌkoʊ-/ *noun*
هاوژینی، پێکەوەژیان (بێ ژنومێردایەتی، لەگەڵ پێوەندی سێکسی): *There have been great changes in the patterns of marriage, divorce and cohabitation* ◊ (figurative) *a period of cohabitation between a conservative government and a socialist president* ◌ زندگی مشترک، همزیستی

**cohen** = kohen

**coheir** /'kəʊe(r)/ *noun*
هاومیراتگر، بەشدار لە میراتبەریدا، هاومیرات، هاوبەشبەر ◌ هممیراث

**coheiress** *noun, fem.* coheir
(ژن) هاومیراتگر، هاومیرات، هاوبەشبەر ◌ (زن) هممیراث

**coherence** /kəʊ'hɪərəns, US koʊ'hɪr-/ *noun*, also -cy /kəʊ'hɪərənsɪ/
1 یەکگرتوویی، پێوەندی لۆژیکی، پێکەوەبەستراوی، یەکیەتی، یەکپارچەیی، یەکگیری، هاوڕێکی، یەکگرتن 2 پێوەلکان، پێکانووسان، پێکەوەنووسان، پێکالکان، بەیەکالکان (فیزیک) ◌ 1 انسجام، پیوستگی، وحدت 2 چسبندگی، همدوسی (فیزیک)

**coherent** /kəʊ'hɪərənt, US koʊ'hɪr-/ *adjective*
1 هاوڕێک، ڕێکوپێک، یەکگرتوو، یەکانگیر، لۆژیکی، یەکپارچە: *a coherent narrative/account/explanation* ◊ *a coherent policy for the transport system* 2 خاوەنی پێوەندی لۆژیکی، ڕوشن، ڕوون، تێگەیشتنئاسان: *She only became coherent again two hours after the attack* 3 پێکالکاو، پێوەلکاو، پێوەنووساو ◌ 1 منسجم 2 واضح 3 همدوس

**coherently** /kəʊ'hɪərəntli, US koʊ'hɪr-/ *adverb*
بە ڕوونی: *to express yourself coherently* ◌ به وضوح

**cohesion** /kəʊ'hiːʒn, US koʊ-/ *noun*
1 یەکگرتوویی، ڕێکوپێکی، پێوەندی لۆژیکی، هاوگرتوویی، پێکەوەبەستراوی، یەکیەتی، یەکپارچەیی، یەکگیری، هاوڕێکی، یەکگرتن: *the cohesion of the nuclear family* ◊ *social/political/economic cohesion* 2 (فیزیک) پێوەلکان، پێکانووسان، پێکاچەسپان، پێکەوەنووسان، بەیەکالکان ◌ 1 انسجام، پیوستگی، وحدت 2 چسبندگی 3 همدوسی

**cohesive** /kəʊ'hiːsɪv, US koʊ-/ *adjective*
1 هاوڕێک، ڕێکوپێک، یەکگرتوو، یەکخەر، یەکپێگر، پێکانووسێن، پێکەوەچەسپێن، پێکەوەلکێن، پێکەوەبەست، گرێدەر: *a cohesive group* ◊ *the cohesive power of shared suffering* ◊ *well-structured sentences illustrating the use of cohesive markers such as 'nevertheless' and 'however'* 2 (فیزیک) سەربە پێکانووسان یان پیالکان ◌ 1 منسجم، متحد، متحدکننده 2 چسبنده 3 وابسته به همدوسی

**cohesively** /kəʊ'hiːsɪvli, US koʊ-/ *adverb*
بە شێوەیەکی ڕێک(وپێک) ◌ به طور منسجم

**cohesiveness** /kəʊ'hiːsɪvnəs, US koʊ-/ *noun*
ڕێکی، هاوڕێکی، ڕێکوپێکی، یەکیەتی، یەکگرتوویی، هاوگرتوویی: *a strong sense of -iveness within the family* ◌ انسجام، اتحاد

**coho** /'kəʊhəʊ/ *noun*, also cohoe, *pl.* cohos or cohoes
جۆری سەلمونی پاسیفیکی باکووری، خاڵوردی ڕەش [*Oncorhynchus kisutch*] (هەروەها coho salmon یان silver salmon) ◌ کوهو

**cohort** /'kəʊhɔːt, US 'koʊhɔːrt/ *noun*
1 یەل، یەکەیێکی سپایی ڕۆمی کۆن، بەرامبەر بە دەیەکی لیژیونێ 2 گرووپ، دەستە، داوودەستە، دەسوپێوەن ◌ 1 کوهورت 2 گروه، همقطاران

**cohosh** /kə'hɒʃ/ *noun*
جۆرێ گیای ئەمریکای باکووری، بۆ دەرمان دەبێ [*Cimicifuga racemosa* (هی ڕەش) و جۆرەکانی تر] ◌ نوعی گیاه

**cohune** /kə'huːn/ *noun*
دارخورمای ئەمریکای ناوەندی، ناوکەکەی سەرچاوەیێکی بەنرخی ڕۆنە [*Orbignya cohune*] ◌ کوهون

**coif** /kɔɪf/ *noun*
1 کلاو 2 (مێژوویی) جۆری (کلاو)خوود 3 کلاو یا ئارەقچنی سپی پارێزەر یان دادگەرانی پایەبەرز ◌ 1 گیسپوش 2 و 3 کویف

**COI** *abbreviation* Central Office of Information
(لە بریتانیا) سیئۆئای (= نووسینگەی ناوەندی زانیاری) ◌ سیآی

**coiffeur** *noun, fem.* coiffeuse /kwɑː'fɜːz,

US kwɒ-/
(فەرەنسی) سەلمانی، دەلاک، ئارایشت‌گەر ◯ آرایش‌گر

**coiffure** /kwɑːˈfjʊə(r), US -ˈfjʊr/ *noun*
(فەرەنسی) شێوازی قژ، داهێنانی سەر یان قژ ◯ مدل مو

**coiffeuse** /kwɑːˈfɜːz, US kwɒ-/ *noun*
رازێنەر، ئارایشت‌گەر، جوانکار (ژن) ◯ آرایش‌گر

**coign** /kɔɪn/ *noun*
گۆشەی دەربەرپوی دیواری، بەردی گۆشە ◯ گوشە، سنگ زاویە

**coil**[1] /kɔɪl/ *noun*, also IUD
قەف، ئالقە، چەمەرە، قلف، توق، تەوق، گینگلە، قانگلە، پەپکە، پێچ، لوول، پێچۆک، قەف‌قەفە، قەفان، کۆیل، تێل‌پێچ (کارەبا؛ بنەرەت: لە *coillir ،cuillir* فەرەنسی "کۆکردنەوە to gather") ◯ حلقە، کلاف، سیم‌پیچ

**coil**[2] /kɔɪl/ *noun*
(کۆن) ئاژاوە، ئالۆزی، پشێوی، شێواوی ◯ آشوب

**coiled** *adjective*
قەفاوی، قەف‌قەف، ئالقەئالقە، پێچاوی، پێچ‌پێچ، لـــوولـــوول، لـــوولاوی، پێچـــۆکی، پەپکەخواردوو(بەستوو) ◯ حلقوی

**coin** /kɔɪn/ *noun*
کۆین، سکە، پوولەوردە، قەرەپوول، وردەپارە، قۆشە ◯ سکە، پول خرد

**coinage** /ˈkɔɪnɪdʒ/ *noun*
1 لێدانی کۆین، سکە: *gold/silver/bronze coinage* 2 پارە (لە گەردا)، پارە یان پوولی برەودار یان برەومەند: *3 decimal coinage* وشە یان زاراوەی نوێ، وشەی داهێنراو یان دارێژراو، وشەی داتاشراو: *4 new coinages* دارشتن یان داهێنان 5 وشەدارشتن، وشەداتاشی ◯ 1 ضرب سکە، سکە 2 پول 3 واژە یا اصطلاح نو 4 ابداع 5 واژەسازی

**coin box** *noun*
تەلەفونی گشتی، تەلەفونی کۆینی ◯ تلفن سکەای

**coincidence** /kəʊˈɪnsɪdəns, US koʊ-/ *noun*
1 هەڵکەوت، ریکەوت، پێکەوەرووداو، پێکەوەقەومان، بەیەکەوەرووداو، هاورووداوی، جووت‌بوون: *a strange/a remarkable coincidence* 2 یەک‌گرتنەوە، جۆربوون، گونجان، کۆکی، سازان، ریک‌کەوتن، یەک‌کەوتن 3 لێکچوون، وەک‌یەکی، دەقاودەقی، یەکسانی، هاوشێوەیی ◯ 1 اتفاق، تصادف، انطباق، تطابق 2 توافق، سازگاری 3 هم‌سانی

**coincident** /kəʊˈɪnsɪdənt, US koʊ-/ *adjective*
1 هاوکات، پێکەوەرووداو، جووت‌بوو، یەک‌گیر، یەکان‌گیر: *coincident events* 2 ریک‌کەوتوو، یەک‌کەوتوو، گونجاو، کۆک، جۆر(بوو)، سازاو 3 وەکیەک، هاوشێوە، دەقاودەق، لێکچوو، یەکسان ◯ 1 مقارن، مصادف، مطابق، منطبق 2 موافق، هماهنگ 3 هم‌سان

**coincidental** /kəʊˌɪnsɪˈdentl, US koʊ-/ *adjective*
بەپێی ریکەوت، لە خۆوە، هەڵکەوتی، (خۆ)شانسی، بێ‌بەرنامە، هەرواڕووداو: *a coincidental resemblance* ( coincidentally :/kəʊˌɪnsɪˈdentl, US koʊ-/ *adv* *Coincidentally, they had both studied in Paris*) ◯ اتفاقی

**coincidently** /-təli/ *adverb*
بەهەڵکەوت، بەریکەوت، بە ریرەوی ◯ تصادفاً

**coiner** /ˈkɔɪnə(r)/ *noun*
قەڵبەزەن، قەڵبەژەن، کۆینێر ◯ سکەزن

**coinheritance** *noun*
هاوبۆماوەیی، هاومیراتی ◯ اشتراک در میراث

**coin-op** *noun*
(دەزگای) کۆینی، سکەیی، بە سکە ◯ سکەای

**coin-opperate** = coin-op

**Cointreau** /ˈkwʌntrəʊ/ *noun*
(دروشمی بازرگانی) لیکۆرێکی نارنجی‌تامی بێ‌رەنگ ◯ کوینترو

**coir** /ˈkɔɪə(r)/ *noun*
ریشاڵی گوێزهێند یان نارگیل ◯ الیاف نارگیل

**coital** *adjective*
پێوەندی بە نزیکی سێکسی(یەوە) هەیە ◯ وابستە بە مقاربت

**coitus** /ˈkɔɪtəs, ˈkəʊɪtəs, US ˈkoʊ-/ *noun*, also coition/kəʊˈɪʃ(ə)n/
نزیکی، نیان، جووت‌بوون، هاوجێیی ◯ مقاربت، نزدیکی

**coitus interruptus** /ˌkɔɪtəs ɪntəˈrʌptəs, ˌkəʊɪtəs, US ˌkoʊ-/ *noun*
نزیکی نیوەچڵ (زووتر دەرهێنانەوەی سیرەت، بە مەبەستی بەرگیری لە منداڵبوون، لاتینی نوێ، interrupted coitus) ◯ جماع منقطع

**cojones** /kəˈhoʊneɪz/ *noun, pl.*
1 گونەویلەی پیاو 2 وێران، ئازایی، نەترسی ◯ 1 بیضەی مرد 2 جرأت

**coke**[1] /kəʊk, US koʊk/ = cocaine

**coke**[2] /kəʊk, US koʊk/ *noun*
1 کۆک (= جۆری سووتەمەنی توند) 2 پاشەرۆکی کاربۆن کە دوای دڵۆپاندن یان سووتاندنی ناتەواوی بێنزین یان سووتەمەنی‌یەکانی‌تر ماوەتەوە ◯ کک

**Coke** /kəʊk, US koʊk/ = Coca Cola

**Col** *abbreviation* Colonel

**col.** *abbreviation* column
ستوون (رۆژنامە و هتد) ◯ ستون

**col** /kɒl, US kɑːl/ *noun*

1 مله، بستو، زینو، کەل، سەریال، دەربەند، نەوی، 2 saddle 3 (کەشناسی) مله ۞ 1 گردنه 2 کول

**col**[1]**-** *prefix*

پێشگر: هاوواتای پێشگری com، و پێش L دێ ۞ پیشوند: مترادف com

**col**[2]**-** *prefix*

پێشگر: کۆلان، کۆلۆن: *colitis*، *colostomy* ۞ پیشوند: قولون

**cola** /ˈkəʊlə, US ˈkoʊlə/ *noun*

1 (هەروەها kola) داری کۆلا (ڕۆژاوای ئەفریکا [*Cola acuminate* و جۆرە پێوەندیدارەکان]) 2 ساردی بێئەلکۆل ۞ 1 درخت کولا 2 کولا

**colander** /ˈkʌləndə(r), US ˈkɑːl-/ *noun*

پاڵێونە، پلاوپاڵێو، پاڵێوکە، سەلە، سووزمە، پارزنگ ۞ آبکش

**Colby** *noun*

کۆلبی: جۆرێ پەنیری نەرم و تەڕ، شێوەی Cheddar دەدا ۞ کولبی

**colcannon** /kɒlˈkanən/ *noun*

جۆرێ چێشتی پەتاتە و کەلەمی ئیرلەند و سکاتلەند ۞ آبکش

**colchicum** /ˈkɒltʃɪkəm, US ˈkɒlk-/ *noun, pl.* colchicums

1 جۆرێ گیا کە crocusی پاییزی لەو تیرەیە [تۆخم *Colchicum*] 2 دەنک یان تۆوی وشکەوەبووی گوڵەزافەران ۞ نوعی گیاه

**cold** /kəʊld, US koʊld/ *adjective* (colder, coldest), *adverb, noun*

*adj* 1 سارد، ساردایی، بێهەست، ساردوسڕ، بێسۆز، وشک (هەڵس‌وکەوت) 2 کەم (بۆن) 3 ساردمەزاج، سارد (سێکسی) 4 مردوو، بێهۆش، لەسەرخۆچوو، دوور (لە کایەی منالاندا) *adv* 1 کت‌وپڕ و بەتەواوەتی، تەواو، بەتەواوی 2 بێئامادەیی، لەخۆوە *n* 1 سەرما، هەوای سارد، ساردی 2 هەلامەت، سەرمابوون، پەژیک، بەرسیو (*cald* ئینگلیسی کۆن، ئەڵمانی بنەڕەت، پێوەندی بە *gelu* لاتین هەیە "frost") ۞ *adj* 1 سرد، بی‌احساس 2 کم 3 سر و مزاج 4 مرده، بی‌هوش، پرت *adv* 1 ناگهانی و کاملاً، کاملاً 2 فی‌البداهه *n* 1 سرما، هوای سرد 2 سرماخوردگی

**cold-blooded** *adjective*

خوێنسارد، بێبەزەیی، بێڕوحم، دڵڕەق، زۆردارانە، دڵڕەقانە، زاڵمانە، خوێنساردانە ۞ خونسرد، بی‌رحم، بی‌رحمانه، خونسردانه

**cold-bloodedly** *adverb*

بێبەزەییانە، بێڕوحمانە، خوێنساردانە ۞ بی‌رحمانه، خونسردانه

**cold-bloodedness** *noun*

بێبەزەییتی، بێڕوحمی، خوێنساردی ۞ بی‌رحمی، خونسردی

**cold-cash** = hard cash

**cold cathode** *noun*

(ئیلیکترۆنیک) ژێرکە یان کاتۆدی سارد ۞ کاتود سرد

**cold chisel** *noun*

ساردەئەسکەنە، سمۆ، ساردەبڕ، قەڵەمەی کانزابڕ یا سەرپان ۞ قلم سردبُر

**cold comfort** *noun*

دڵخۆشکەر ۞ دل‌خوشکنک

**cold cream** *noun*

کریمی دەم‌وچاو یا پێست ۞ کرم صورت یا پوست

**cold cuts** *noun*

گۆشتی سارد (چێشت یا خۆراک) ۞ گوشت سرد

**cold feet** *noun,* get *or* have cold feet

خۆکێشانەوە، خۆدزینەوە، هەلاتن، جیفرک، فیزمالک ۞ جا زدن

**cold fish** *noun*

مرۆی ساردوسڕ ۞ آدم سرد و بی‌احساس

**cold frame** *noun*

(لە) سەرما (ساردی) پارێز، چوارچێوەی ساردی یان سەرما (باخەوانی) ۞ شاسی سرد

**cold front** *noun*

بەرەی هەوای سارد، بەرەی سەرما ۞ جبهه‌ی سرد

**cold-hearted** *adjective*

دڵڕەق، بێبەزەیی، بێهەست، سڕ (بڕوانە warm-hearted) ۞ بی‌رحم، بی‌حس

**cold-heartedly** *adverb*

دڵڕەقانە، بێبەزەییانە، بێهەستانە ۞ بی‌رحمانه، به طور بی‌حس

**cold-heartedness** *noun*

دڵڕەقی، بێبەزەییتی، بێهەستی، سڕی ۞ بی‌رحمی، بی‌حسی

**coldly** /ˈkəʊldli, US ˈkoʊld-/ *adverb*

بە ساردییەوە: *to stare/smile/reply coldly* ۞ با سردی

**coldness** /ˈkəʊldnəs, US ˈkoʊld-/ *noun*

1 ساردی: *the icy coldness of the water* 2 ساردوسڕی، بێمەیلی: *She was hurt by the coldness in his voice* ۞ سردی

**cold-short** *adjective*

(کانزا) ساردەقرپ (قرپە لە دۆخی ساردیدا) ۞ کولدشورت

**cold-shoulder** *noun*

گوێپێنەدان، بێدەربەستی، بەهێندنەگرتن، کەمتەرخەمی، سووکایەتی: *got the -d shoulder from an old friend* ۞ بی‌اعتنایی، تقصیر

**cold snap** *noun*

(نافەرمی) سەرمای ناکاو و کورتماوە ۞ سرمای ناگهانی و زودگذر

**cold sore** *noun,* also fever blister

تێمیک، تامیک، خشرۆک، زیپکەی لای لێو (بەهۆی ڤایرۆسی herpes simplex ـەوە تووش

دەبێ) ◌ تب‌خال

**cold spell** *noun*
ماوەیێ کە هەوا ساردترە لە دۆخی ئاسایی ◌ کلد سپل

**cold storage** *noun*
1 ساردخانە، ساردگە 2 دواخستن، پاش خستن، بەکنگاخستن، :abeyance *I've had to put my plans into cold storage* ◌ 1 سردخانە 2 تعویق

**cold store** *noun*
ساردخانە، ساردگە ◌ سردخانە

**cold sweat** *noun*
خۆی سارد، ئارەقی سارد ◌ عرق سرد

**cold turkey** *noun, adverb*
*n* دۆخی وەلانان، خوماری *adv* (نافەرمی) کوتوپڕی، بێئامادەیی، :abruptly *quit smoking -d turkey* ◌ *n* خماری *adv* بلامقدمه

**cold war** *noun*
شەڕی سارد: نێوان ولاتانی بلۆکی سۆڤیەت و هێزەکانی رۆژاوا، بەبێ دابڕینی پێوەندی دیپلۆماتیک، پاش شەڕی جیهانی دووهەم ◌ جنگ سرد

**cold wave** *noun*
شەپۆلی سەرما یان ساردی ◌ موج سرما

**cole** /kəʊl/ *noun*
(زۆرتر کۆن) چەند جۆرێکی کەلەم ◌ سالاد کلم

**colectomy** /kə(ʊ)'lɛktəmi/ *noun, pl.* colectomies
کۆلۆنبڕی ◌ کولکتومی

**Coleoptera** /ˌkɒlɪ'ɒpt(ə)rə/ *noun, pl.*
(مێروناسی) کالانبالان، بەرگەبالان (قالۆنچەکان و، weevil یەکانیش، گەورەترین دەستەی گیانەوەرانی سەرعەرز پێکدێنن؛ بنەڕەت: لاتینی نوێ، لە *koleopteros* یۆنانی، لە *koleos* ("wing" *pteron* + "sheath") ◌ کولیوپترا

**coleopteran** *noun, adjective*
(مێرووی) کالانبال، بەرگەبال ◌ کولیوپتران

**coleoptile** /ˌkɒlɪ'ɒptʌɪl/ *noun*
(ڕووەکناسی) بەرگەبەر ◌ کولیوپتایل

**coleorhiza** /ˌkɒlɪə(ʊ)'rʌɪzə/ *noun, pl.* coleorhizae /-'rʌɪziː/
(ڕووەکناسی) بەرگەرەگ، بەرگەریشە، مەتالەریشە ◌ کولیورایز

**coleslaw** /'kəʊlslɔː, US 'koʊl-/ *noun*
سالاتی کەلەم ◌ سالاد کلم

**cole tit** = coal tit

**coleus** /'kəʊlɪəs/ *noun*
(ڕووەکناسی) چاف‌رەشۆک، گیایێکی گەرمێنانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا، لە تیرەی mint [توخم *Coleus*] ◌ حسن یوسف، نجده

**coley** /'kəʊli/ = saithe

**colic**[1] /'kɒlɪk, US 'kɑːlɪk/ *noun*
کۆلنج، ساردەسنگان، ژانەزگ، زگێشە (بەژان و ب.ت. منالان، بازەلە infantile colic) ◌ قولنج

**colic**[2] /'kɒlɪk, US 'kɑːlɪk/ *adjective*
سەربە کۆلۆن ◌ وابسته به قولون

**colicin** *noun.* also colicine
کۆلیسین: هەریەک لەو ماکە دژەبەکتریا جۆراوجۆرانە کە لە لایەن بەکتریاکانی ریخۆلەوە بەرهەم دێنرێن (وەک E. coli) ◌ کولیسین

**colicky** *adjective*
توشبوو بە کۆلنج یا ساردەسنگان، زگێشەگرتوو، ژانەزگ‌گرتوو، کۆلنج‌گرتوو ◌ مبتلا به قولنج

**colicroot** *noun*
هەریەک لە چەند جۆری گیا و ڕووەکی ریشەدار کە لە پزشکی خۆمالیدا بۆ چارەسەری کۆلیک بەکاردێترا، ب.ت. *Aletris farinosa* و *A. aurea* لە خێزانی lily ◌ کولیک‌روت

**coliform** /'kɒlɪfɔːm/ *adjective*
سەربە کۆمەڵێ لەو بەکتریا میلەئاسایانە (وەک *E. coli* (Escherichia coli)، زۆرتر لەنێو ریخۆلە و کۆلۆن‌دا هەیە) ◌ کولیفورم

**coliseum** /ˌkɒlɪ'siːəm/ *noun.* also colosseum
وەرزشگا، سینەما یان تیاترێکی گەورە (بنەڕەت: لە *Colosseum* لاتینەوە، ناوی ئامفی‌تیاترە زلوزەبەنەکەی ڕۆمی کۆن) ◌ کالسیوم

**colitis** /kə'laɪtɪs/ *noun*
هەوکردنی دیوارەی کۆلۆن، کۆلۆنەسوێ ◌ التهاب قولون

**coll or collo-** *prefix*
پێشگر: 1 چەسپ، سریش، کەتیرە، هێلم :glue *collenchyma* 2 مـــــل :colloid *collotype* (بنەڕەت: لە لاتینی نوێوە، ئەویش لە koll و kollo یۆنانی‌یەوە) ◌ پیشوند: 1 چسب، سریش 2 کلوئید

**collaboration** /kəˌlæbə'reɪʃn/ *noun*
1 یارمەتی‌دان، هاوکاری، کاریرا، ئالیکاری، زبارە، هەرەوەز: *It was a collaboration that produced extremely useful results* ◊ *collaboration between the teachers and the government* 2 سیخوڕی، شوفاری، ولاتفرۆشی، خەیانەت، هاودەستی لەگەل دوژمن ◌ 1 تشریک مساعی، همکاری 2 خبرچینی

**collaborationism** *noun*
ولاتفرۆشی، سیخوڕی، دوژمن‌یاریدەدەری ◌ خبرچینی

**collaborationist** *noun, adjective*
ولاتفرۆش، هاودەست لەگەل دوژمن، سیخوڕ، دوژمن‌یار(یدەدەر) ◌ خبرچین

**collaborative** /kə'læbərətɪv, US -reɪtɪv/ *adjective*
بەکۆمەڵ، دەستەیی، پێکفەیی، بە گەل، گەلی، بە

*collaborative* :جـەمـاوەری، گەلەکۆمـەـە ◇ جمعی، گروهی *projects/studies/research*

**collaboratively** /kəˈlæbərətɪvli, US -reɪtɪvli/ *adverb*

پێکـەوە، بەکۆمـەڵ، بـە شـێوەیەکی دەسـتەیی، گەلانە، بە هاوکاری ◇ به طور گروهی، مشترکاً

**collaborator** /kəˈlæbəreɪtə(r)/ *noun*

هاوکار، ئالیکار، ئاریکار، بەشدار، یارمەتی دەر، پشکدار ◇ همکار، شریک

**collage** /ˈkɒlɑːʒ, US kəˈlɑːʒ/ *noun*

کالاژ، کولاژ، لەتکاری، لەتبەندی (وێنە، پارچە، کاغز و هتد) ◇ کولاژ

**collagen** /ˈkɒlədʒ(ə)n/ *noun*

(زیندەکیمیا) کالاژین، سریشساز(ـە)، کـولاژین (= پـــرۆتئینی نێـــو جومگـــەی مـــرۆڤ و (بـەسـتەرەشـانەی) گیانـەوەران؛ بنـەرەت: لـە *collagène* فەرەنسـی، لە *kolla* یۆنانی "glue" + *-gène* فەرەنسی (بڕوانە gen-) ◇ کولاژن

**collagenase** *noun*

(زینـدەکیمیا) کالاژینـاز، کۆلاژینـاز، کولاژینـاز: هەموو کۆمەڵی هەوێنە protcolytic ـەکان کە کۆلاژین و ژێلاتین شی دەکەنەوە ◇ کولاژناز

**collagenic** *adjective*, also collagenous

ســەربــە کــالاژین، کــولاژینی، ســەربــە سریشساز(ـە) ◇ کولاژنی

**collagist** *noun*

کالاژیست، لەتکار، لەتبەند ◇ کولاژیـست

**collapsar** /kəˈlapsɑː/ *noun*

(ئەستێرەوانی) کۆلاپـار: ئەستێرەیێکی پیر کە لەبەر قورسایی‌یەکەی رووخاوە و گرگنەی سپی white dwarf، ئـەسـتێرەی نـوترۆنی یـان چاڵەرەشی پێکدێنێ ◇ کولاپسار

**collapse** /kəˈlæps/ *noun*

1 رووخـــان، داڕووخـــان، کـــەوتن، داتـــەپین، تێک‌تەپین: *The walls were strengthened to protect them from collapse*، تـیـاچوون، لـەنێوچوون، هـەرەس‌هێنـان، رمـان، دارمـان، هەرەمین، لێک‌هەڵوەشان، تێشکان، بەزین: *the collapse of law and order in the area* 2 پێچـوون، کزبـوون، داچـوون: *a state of mental/nervous collapse* 3 کـەم‌بوونـەوەی کـت‌وپـڕی نـرخ: *the collapse of share prices/the dollar/the market* 4 (جوگرافی) تلیـسـانەوە (*adj* collapsed: *collapsed* *a collapsed investment bank* ◊ *buildings* ◊ *a collapsed lung*) ◇ 1 ریـزش، سـقوط، اضمحلال، فروپاشی، تلاشی، شکـسـت 2 ضـعف 3 کاهش ناگهانی قیمت 4 رُمبش

**collapsible** /kəˈlæpsəbl/ *adjective*

1 قـەدکراو، نووشـتاو، کۆوەبـوو، قـەد دەکـرێ، دەنووشـترێتەوە 2 لـەڕووخان‌هـاتوو، دەڕووخـێ ◇ 1 تاشو 2 قابل فروپاشی

**collar** /ˈkɒlə(r), US ˈkɑːl-/ *noun*

1 یەخـــە، پێـــسیر، گوجـــو، دۆرک، بـــەرۆک، بەرکۆزە، ملشۆ، ملەوان، مليوان 2 ملقان، قەلاتـە، قـەلانگ، ملوێنـک، گوێرەوسـار، رسـت، زۆڵ، کەلـێن، تـەوق، تـۆق 3 گۆشـتی مـل 4 بەسـت، ئالقە، بەند، لێک‌هەڵپێک، دەوربەسـت ◇ 1 یقـه 2 قلاده، طوق 3 گوشت گردن 4 بند، اتصال

**collarbone** /ˈkɒləbəʊn, US ˈkɑːlərboun/ *noun*, also clacicle

ئێسکی چەلەمە، خەمازە ◇ استخوان تَرْقوه

**collard greens** /ˈkɒlɑːd griːnz, US ˈkɑːlərd/ = kale

**collard(s)** /ˈkɒlɑːd/ *noun*

تۆپەکەلەم ◇ کلم‌پیچ

**collared dove** *noun*

جـۆرێ کـۆتری قـاوەیی بـۆر [ *Streptopelia decaocto*] ◇ نوعی کبوتر

**collaret(te)** /ˌkɒləˈret/ *noun*

ملیوانی ژنانەی تۆڕی یان تووکی ◇ کلارت

**collarless**/ˈkɒlələs, US ˈkɑːlərləs/ *adjective*

بێ‌ملیوان، بێ‌یەخە ◇ بدون یقه

**collar stud** *noun*

دوگمەی ملیوان یان یەخە ◇ دکمەی یخه

**collar-work** *noun*

کاری سەخت، کاری گران یان پڕئەرک ◇ کـار توان‌فرسا

**collateral** /kəˈlætərəl/ *adjective, noun*

*adj* 1 شـان‌بەشـان، تەنیـشت‌بەتەنیشت، ملەملـە، مل‌بەمل، پێ‌بەپێ، هاوتەریب، هاوڕێک، لاوەکی، لابەلایی: *collateral states like Athens and Sparta* 2 زیادی، سەربار: *collateral benefits* 3 خـــوێنی یـــان پـــشتی، لاخـــزم، بـــۆرەخزم، ناڕاستەوخۆ (خزمایەتی لـە یـەک تیـرە، بـەڵام دوور) 4 دەسـتەبەرکراو 5 بارمتـەیی *n* بارمتـە: *We had put our house up as -ateral for our bank loan* ◇ *adj* 1 بـە مـوازات هـم، موازی، پهلو بـه پهلـو، ثـانوی، جنبـی 2 اضـافی 3 نسبی (خویشاوند) 4 تضمینی 5 وثیقەای *n* وثیقه

**collateral damage** *noun*

زیـــان(وزەرەری) ناڵەشـــکری (ناســـەربازی)، زیان‌وزەرەری لاوەکی (شەڕ) ◇ خـسارات جانبی

**collateral security** *noun*

بارمتە ◇ وثیقه

**collation** /kəˈleɪʃn/ *noun*

1 پێـــک‌گـــرتن، بـــەراوردکاری، بەرهـــەڤدان، بەریەک‌گرتن، هاوبەری، پێک‌هەڵسەنگاندن 2 بەرکوڵ، سووکەژەم 3 بەربانگ، عەسرەژۆ ◇ 1 هم‌سنجی، تطبیق 2 غذای مختصر 3 افطاری

**collator** *noun*

پێـــک‌گـــر، بـــەراوردکار، بەرهـــەڤدەر،

پێکەوەهەڵسەنگێنەر ◌ مقایسەکنندە

**colleague** /'kɒli:g, US 'kɑ:-/ *noun*

1 هاوکار 2 هاوڕێیاز، هاوخەبات ◌ 1 همکار 2 هم‌قطار

**colleagueship** /'kɒli:gʃɪp, US 'kɑ:-/ *noun*

1 هاوکاری 2 هاوڕێیازی، هاوخەباتی ◌ 1 همکاری 2 هم‌قطاری

**collect** /kə'lekt/ *noun*

دوعا، نزا، کورتەنوێژ ◌ دعا، نماز کوتاه

**collectability** /-'bɪlɪti/ *noun*

بەنرخی، لەکۆکردنەوەهاتوویی، جوانی ◌ قابلیت جمع‌آوری

**collectable** /kə'lektəbl/ *adjective*, also collectible

بەنرخ، شیاوی کۆکردنەوە، شایانی خڕکردنەوە، جوان ◌ قابل جمع‌آوری

**collect call** *noun*

کالێکت کۆڵ (قسەکردنی تەلەفونی) ئەو کەسەی کەوا تەلەفونی بۆ کراوە، پارەکەی دەدا ◌ کالکت کول

**collected** /kə'lektɪd/ *adjective*

لەسەرەخۆ، خۆددار، ئارام، هێمن، مەند ◌ خوددار، خون‌سرد

**collectedly** /kə'lektɪdli/ *adverb*

بە لەسەرەخۆیی، بە شێنەیی، بە ئارامی ◌ خون‌سردانه

**collected works** *noun, pl.*

کۆبەرهەم، کۆمەڵەبەرهەم، ئاسەوارەکان، شوێنەوارەکان ◌ کلیات

**collecting** *noun*

کۆکرنەوە، خڕکردنەوە (پوول و هتد) ◌ جمع‌آوری

**collection** /kə'lekʃn/ *noun*

1 خڕکردنەوە، کۆ، کۆکردنەوە، گردکردنەوە، گردوکۆ، کۆمەڵەکردن، کۆگەری، پێکەوەنان، کۆمکردن، سەریەکنان، کەڵەکەکردن: *The first stage in research is data collection* 2 کۆمەڵە: *a collection of favourite Christmas music* ◊ *a collection of stories by women writers* 3 *a stamp/coin, etc. collection* ◊ وەرگرتن 4 خڕکردنەوەی باربۆ و پیتاک؛ پیتاک، باربۆ (خڕەوەکراو): *The total collection last week amounted to £250* 5 کۆما، لۆدە، کۆگا، کەڵەکە، کۆمەڵ، دەستە، ژمارە ◌ 1 گردآوری، انباشت 2 مجموعە 3 وصول 4 جمع‌آوری اعانه؛ اعانه 5 کپه، توده، گروه، عده

**collective** /kə'lektɪv/ *adjective, noun*

*adj* 1 کۆمەڵی، بەکۆمەڵ، بەگەڵ، کۆیی، هاوبەش، پێک(ە)وەیی، دەستەیی، جەماوەری، دابەشکراو، گشتی، گەلەمپەری، تێکڕایی: *collective decision-making/responsibility* ◊ *collective leadership* 2 (ئاماژە بە تێکڕای ئەندامانی) گروپ، کۆمەڵ، دەستە، چین 3 زیارە، هەرەوەز *n* (ڕێزمان) ناوی کۆ: *flock is a collective word* ◌ *adj* 1 جمعی، گروهی، مشترک، عمومی، کلی 2 (اشاره به کل اعضاء) گروه، طبقه 3 تعاونی *n* (دستور زبان) اسم جمع

**collective agreement** *noun*

ڕێککەوتنی بەکۆمەڵ، پێکەوە ڕێککەوتن ◌ توافق جمعی

**collective bargaining** *noun*

سەودا یان مامەڵەی بەکۆمەڵ (کرێکار و خاوەنکار)، گەلەسەودا ◌ معاملەی جمعی

**collective farm** *noun*

کێڵگەی هاوبەش، کێڵگەشەریکە، گەلەکێڵگە ◌ مزرعەی مشترک

**collectively** /kə'lektɪvli/ *adverb*

پێکەوە، بەگەڵ، بەکۆمەڵانە، یەکڕێ، هەموو: *the collectively agreed rate* ◌ به طور جمعی، مشترکاً

**collective noun** *noun*

(ڕێزمان) ناوی کۆ ◌ اسم جمع

**collective security** *noun*

ئاسایش(ـت)ی گشتی ◌ امنیت جمعی

**collective unconscious** *noun*

ناهۆشیاری بەکۆمەڵ، ناخودئاگای بەکۆمەڵ ◌ ناخودآگاه جمعی

**collectivism** /kə'lektɪvɪzəm/ *noun*

سیستم یان تیۆری هاوبەشیگەری ◌ نظام یا تئوری اشتراکی

**collectivist** /kə'lektɪvɪst/ *noun, adjective*

*n* هاوبەشیگەر، هاوبەشیخواز *adj* سەربە هاوبەشیگەری، هاوبەشیگەریانە ◌ *n* کالکتیویست *adj* کالکتیویستی

**collectivistic** *adjective*

سەربە هاوبەشیگەری ◌ وابسته به کالکتیویسم

**collectivity** /kə,lek'tɪvəti/ *noun*

گشتگیری، کۆیی‌بوون، کۆمەڵێتی ◌ جامعیت

**collectivization** /kə,lektɪvaɪ'zeɪʃn, US -və'z-/ *noun*

هاوبەشاندن، هاوبەشیکردن، حکومیکردن، ڕاگوێستن لە کەرتی تایبەتییەوە بۆ کەرتی گشتی یا حکومی ◌ اشتراکی‌سازی، دولتی کردن

**collectivized** *adjective*

حکومی، هاوبەشی، هاوبەشییانە ◌ اشتراکی

**collective ownership** *noun*

خاوەنداری بەکۆمەڵ یان هاوبەشییانە، خاوەنایەتی بەکۆمەڵ ◌ مالکیت اشتراکی

**collector** /kə'lektə(r)/ *noun*

1 خڕکەرەوە، کۆکەرەوە، کۆگەر: *a stamp collector* ◊ 2 *ticket/tax/debt collectors* کاربەدەستی وەرگرتن، بەرپرسی کۆکردنەوە؛ کاربەدەست یان فەرمانبەری دارایی 3 (ئێلێکترۆنیک) کۆگەر، کۆکەرەوە، solar

2 گـردآور 1 ۞ (collectorship *n*) collector مأمور وصول؛ تحصیل‌دار 3 کالکتور

**collector's item** *noun*, also collector's piece
بابەت یان شتی کۆکردنەوەیی، شتی بێ‌وێنە ۞ شی کلکسیونی

**colleen** /kɒ'li:n, US kɑ:'l-/ *noun*
1 کچ یان ژنی جەحێڵ (گەنج) 2 کچ یان ژنی جوان و جەحێڵی ئیرلەندی ۞ 1 دختر یا زن جوان 2 دختر یا زن جوان ایرلندی

**college** /'kɒlɪdʒ, US 'kɑ:l-/ *noun*
1 کـۆلێژ 2 خوێنـدنگای بـالا 3 خوێنـدنگا، قوتابخانە 4 خانوو یان خانووەکانی کۆلێژ، کۆلێژوبەرە 5 کارکەران یان خوێندکارانی کۆلێژ 6 کۆڕ، بنکە، لیژنە، کۆمەڵە ۞ 1 دانشکده 2 مدرسەی عالی 3 مدرسه 4 ساختمان دانشکده 5 پرسنل یا دانشجویان دانشکده 6 انجمن، مجمع

**College of Cardinals** *noun, pl.*
کۆلێژی کاردیناڵەکان ۞ دانش‌کدەی کاردینال‌ها

**college of education** *noun*
کـۆلێژی راهێنـان (مامۆستایانی خوێنـدنگا) ۞ دانش‌کدەی آموزش

**collegian** /kə'li:dʒɪən, US -dʒ(ə)n/ *noun*, also colleger
خوێنـدکاری کـۆلێژ، دەرچـووی کـۆلێژ ۞ دانشجوی یا فارغ‌التحصیل دانشکده

**collegiate** /kə'li:dʒiət/ *noun*, also collegial /kə'li:dʒɪəl, -dʒ(ə)l/
1 خوێندکاری‌یانە، کۆلێژی 2 (زانکۆیی) کە لە چەندین کۆلێژی جیاجیا پێکهاتبێ ۞ 1 دانشجویی، دانشکده‌ای 2 متشکل از دانشکده‌های متعدد

**collegium** /kə'li:dʒɪəm/ *noun, pl.* collegia /kə'li:dʒɪə, -dʒə/
1 کۆمەڵگای موسیقاژەنە ئاماتۆرەکان، ب.ت. ئـەوەی کـە بـە زانکـۆی ئـەمریکایی یـان ئەڵمانی‌یەوە نووسابێ 2 (مێژوویی) دەستەی بەڕێوەبەرایەتی لە رووسیادا ۞ کولیجیوم

**collegium musicum** = collegium, *pl.* collegia musica

**collenchyma** /kə'lɛŋkɪmə/ *noun*
(رووەک‌ناسی) شانەی شەش‌پاڵوویی، کۆلێنشیم، کۆلێنکیم: توێ‌یێکی شانەی رووەکی، پێکهاتوو لە خانە درێژەکان کە لە گۆشەکان‌دا ئەستوورترە؛ جۆرێ خانەی رووەکی یان گیایی بە دیوارەی کەم‌تاکورتێ ئەستوور ب.ت. لە گۆشەکانی‌دا؛ شانەیێکی رووەکی کە لە خانە زیندووەکان ب.ت. درێژەکان پێکهاتووە و بە شێوەیێکی ناڕێک‌وپێک دیوارەکانی ئەستوورە و وەک پاڵپشتێ ب.ت. لە ناوچە سەرەتا هەڵداوەکان‌دا چالاکی هەیە ۞ کولنشیم

**collenchymatous** *adjective*, also chymatic
کۆلێنشیمی، کۆلێنکیمی ۞ کولنشیمی

**collencyte** *noun*
سرێشەخانە، خانەی سرێشی یان چەسپی: خانەیێکی پادرۆزنەی دەزووناسا کە لە نێو ئیـسفەنجەکان‌دا هەیە ۞ کولنسیت

**Colles' fracture** /'kɒlɪs/ *noun*
(پزشکی) شکانی کۆلیس: شکانی قۆڵ لە مەچەکەدا (بنەڕەت: لە ناوی نەشتەگەری ئیرلەندی Abraham *Colles*) ۞ شکستگی کولیس

**collet** /'kɒlɪt/ *noun*
1 تەوقچە، ملوێنکچە 2 ئاڵقەی نقێم‌دار ۞ 1 طوق‌چه 2 حلقەی نگین‌دار

**collicular** *adjective*
تەپۆچکەیی، سەربە یان پێوەندی بە تەپۆچکەوە هەیە ۞ وابسته به کولیکولوس

**colliculus** /kə'lɪkjʊləs/ *noun, pl.* colliculi /-lʌɪ, -li:/
(توێکاری) تەپۆچکە (ی مێشکی نێوەڕاست، بیستن و دیتنی تیایە؛ بنەڕەت: لە لاتینەوە، چکۆلێنراوی *collis* "تەپ hill") ۞ کولیکولوس

**collie** /'kɒli, US 'kɑ:li/ *noun*
سەگێ لای مەڕ، سەگی مێگەل ۞ سگ گله

**collier** /'kɒliə(r), US 'kɑ:l-/ *noun*
1 کرێکاری کانی خەڵووز، خەڵووزکەن 2 خەڵووزکێش (کەشتی) ۞ 1 معدنچی زغال‌سنگ 2 زغال‌کش

**colliery** /'kɒliəri, US 'kɑ:l-/ *noun, pl.* collieries
کانی خەڵووز، کانەخەڵووز، خەڵووزکان ۞ معدن زغال‌سنگ

**colligation** /ˌkɑ:lə'geɪʃn/ *noun*
یەک‌خستن، پێکەوەگرێدان، پێکەوەبەستن، پێک‌بەستنەوە، دانەدەم‌یەک، لێک‌بەستن ۞ عمل به هم پیوستن

**colligative** *adjective*
(کیمیا) پێک‌بەستنەوەیی (گەردەکان) ۞ کولیگاتیو

**collimation** *noun*
هاوتەریباندن، هاوڕێکاندن، هاوئەندازەکردن، بەرامبەرکردن، (پێکەوە) میزان‌کردن، (پێکەوە) تەرازکردن، هاوتەرازاندن ۞ موازی‌سازی

**collimator** *noun*
هاوتەریبینەر، هاوتەرازێنەر ۞ موازی‌ساز

**collinear** /kɒ'lɪniə/ *adjective*
(زەوی‌ناسی) هەڵکەوتوو لەسەر هێڵێکی راستەوخۆدا، هەمان‌هێڵ ۞ کولینر

**collinearity** *noun*
هەڵکەوتن لەسەر هێڵێکی راستەوخۆ، هەمان‌هێڵی ۞ کولینریتی

**collision** /kə'lɪʒn/ *noun*
1 لێک‌کەوتن، پێکاکێشان، بەیەکاکەوتن، پێک‌کەوتن، بەریەک‌کەوتن: *a collision*

*Stewart was ◊ between two trains*
*injured in a collision with another player*
2 پێکادان، پێکدادان، لێکدان، لێکسرەواندن،
کێشە، ناکۆکی، ناسازی، دژایەتی، ململانێ: *a*
*collision between two opposing points of*
*In his work we see the collision of ◊ view*
(collisional *adj*) *two different traditions*
◌ 1 تصادم، تصادف 2 درگیری، تضاد
**collision course** *noun*, on a collision course
1 لە (سەردەرانەی) بەربەرەکانی یان ناکۆکیدا
بوون، خەریکە بە کێشە دێن 2 لەبەر لێککەوتندا
بوون، بەرەو رووبەرووبوونەوە: *A giant*
*iceberg was on a collision course with the*
*ship* ◌ 1 در آستانه برخورد بودن 2 در مسیر تصادم
**collision frequency** *noun*
لەرە یان فریکوێنسی لێککەوتن یان
بەریەککەوتن ◌ بسامد برخورد
**collision rate** *noun*
خێرایی پێکادان یا لێککەوتن ◌ سرعت برخورد
**collocate** /ˈkɒləkət, US ˈkɑː-/ *noun*
(زمانەوانی) هاوهاتە، کالۆکەیت: *'Bitter' and*
*'tears' are collocates* ◌ همنشین
**collocation** /ˌkɒləˈkeɪʃn, US ˌkɑːl-/ *noun*
1 ڕێکخستن، ڕێکاندن 2 هاوهاتەیی، پێکەوەدانان
(بۆ نموونە لە ئینگلیسیدا، کاری *perform*
لەگەڵ *operation* دا دێ، بەلام لەگەڵ
*discussion* دا نایە: 1 *The doctor*
2 *The* ◊ *performed the operation*
*committee performed a discussion* (لە
جیاتی رستەی دووهەم دەڵێن *The committee*
*held a discussion*) 3 لێکدان (collocational
*adj*) ◌ 1 آرایش، ترتیب 2 همنشینی 3 ترکیب
**collodion** /kəˈləʊdɪən/ *noun*
سریشە، سریشمی پەموو یان لۆکە: گیراوەیێکی
لینجی پیرۆکیسلین (یان پایرۆکسیلین)
pyroxylin (بنەرەت: لە *kollōdēs* یۆنانی
"سریشی glue-like") ◌ کلودیون
**colloid** /ˈkɒlɔɪd/ *noun, adjective*
*n* (کیمیا) مل، چەسپی، سریشک، کۆلۆئید،
کالوید: 1 مادەیێکی ناکریستالی چونیەک
homogeneous کە لە کۆمەڵێ گەردی
molecule زلە یان پارچۆلکەی یەکجار وردی
ultramicroscopic (یان زۆور وردبینەوە)
particles یەک ماک یان مادە پێکهاتووە کە بە
نێو مادەی سێکۆندا بلاوبووەتەوە (وەک ژێل،
سۆل sol و شیراوگەکان) 2 (توێکاری و
پزشکی) ماک یان مادەیێکی ژێلاتینی یان کیمی
و لینجاوی mucinous کە زۆرتر لە تیرۆئید و
شانەی نەخۆش diseased tissue دوزراوەتەوە؛
ماکێکی سریشکی colloidal substance نێو
لەش، وەک دەردراوێکی هەڵگیراو *adj* =

colloidal ◌ *n* کلوئید *adj* کلوئیدی
**colloidal** *adjective*
ملی، چەسپی، سریشکی، سەربە تایبەتمەندی
یان رەوشتی سریشک، کۆلۆئیدی (colloidality
*n* ,colloidally *adv*) ◌ کلوئیدی
**colloidal osmotic pressure** *noun*
پەستانی دەڵێنەی یا دادەرانەی ملی یا سریشکی
◌ فشار اسمزی کلوئیدی
**colloidal solution** *noun*
گیراوەی ملی یان سریشکی، گیراوەی چەسپی
◌ محلول کلوئیدی
**colloidal state** *noun*
دۆخی ملی یان سریشکی، دۆخی چەسپی ◌
حالت کلوئیدی
**colloidal suspension** *noun*
هەڵپەساردنی ملی یا سریشکی ◌ تعلیق کلوئیدی
**collop** /ˈkɒləp/ *noun*
1 لەتەگۆشت، پل 2 چینی گۆشت و بەز ◌ 1
تکەی گوشت 2 کولوپ
**colloq.** = 1 colloquial 2 colloquialism 3
colloquially
**colloquial** /kəˈləʊkwiəl, US -ˈloʊ-/
*adjective*
(زمان) رەمەکی، ئاخافتەیی، ئاخافتنی،
گوتوبێژی، گفتوگۆیی، ناوێژەیی، نافەرمی،
conversational ◌ محاورەای، گفتاری
**colloquialism** /kəˈləʊkwiəlɪzəm, US -ˈloʊ-/ *noun*
1 وشە یان دەستەوشە یان زاراوەی ئاخافتن یان
رەمەکی 2 شێوازی ئاخافتن ◌ 1 واژه یا عبارت
محاورەای 2 سبک محاورەای
**colloquially** /-kwiəli/ *adverb*
بەشێوەیەکی ئاخافتەیی، لە گفتوگۆدا، بە زمانی
گفتوگۆ یان ئاخافتن ◌ به طور محاورەای، به
زبان گفتاری
**colloquium** /kəˈləʊkwiəm, US -ˈloʊ-/
*noun, pl.* colloquiums or colloquia /-kwɪə/
(کۆبوونەوە یان) کۆنفرانس، کۆڕ یان سیمیناری
زانکۆیی (ئاکادیمیک) ◌ کنفرانس یا سمینار
دانشگاهی
**colloquy** /ˈkɒləkwi, US ˈkɑːl-/ *noun, pl.*
colloquies
1 ئاخافتن، وتووێژ، گوتوبێژ، گفتوگۆ،
قسەکردن، دانوستان، conversation،
dialogue 2 کۆبوونەوەیێ بۆ لێدوان دەربارەی
پرسیارە دینەوانییەکان (لە *colloquium* لاتین
"conversation") ◌ 1 گفتوشنود 2 کالوکوی
**collotype** /ˈkɒlətaɪp/ *noun*
چاپی ژێلاتینی (collotypy *n* ;collotypic *adj*)
◌ چاپ ژلاتینی
**collusion** /kəˈluːʒn/ *noun*

پیلان، سازوباز، کەینوبەین، هاوەدەستی، پێکەوەسازان، ڕێکەوتن بۆ خراپەکاری ◌ توطئە، دسیسە، تبانی

**collusive** /kə'lu:sɪv/ *adjective*
پیلانگێرییانە، پیلاناوی (collusively *adv*: پیلانگێرانە) ◌ دسیسەآمیز

**colluvium** *noun, pl.* colluvia or colluviums
ورکەی detritus (تەختە)بەرد یان ورکەبەرد و خۆڵوخاکی (کەڵەکەبووی) داوێنی لێژ و تەلانی، talus (colluvial *adj*) ◌ کولوویوم

**collyrium** /kə'lɪrɪəm/ *noun, pl.* collyria /-rɪə/ or collyriums
کلە، سورمە، دەرمانی (دڵۆپێنی) چاو (بنەڕەت: ئینگلیسی نیوەڕاست: لاتین، لە *kollurion* یۆنانی "poultice") ◌ سرمه

**collywobbles** /'kɒliwɒblz, US 'ka:liwa:-/ *noun, pl.*
1 (نافەرمی و زۆرتر بە شۆخی) دڵەکزێ 2 دڵەڕاوکە، دڵەتەپە، دڵەکوتە، دڵەخورپە ◌ 1 شکم‌درد 2 اضطراب، دلشوره

**Colo.** *abbreviation* of Colorado

**colobus** /'kɒləbəs/ *noun,* also colobus monkey
(گیانەوەرناسی) کۆلۆبۆس: مەیموونێکی ئەفریکای گەڵاخۆری باریک [تۆخمەکانی *Colobus* و *Procolobus*: چەندین جۆرن] (colobine *n*) ◌ کولوبوس

**colocynth** /'kɒləsɪnθ/ *noun*
(ڕووەکناسی) کاڵەکەکەمارانە، خەیاردێمی، تاڵگە، زرکەتاڵ، گوزاڵک، گوژی شەیتان، شفتی تاڵک، هەنزەل [*Citrullus colocynthis*] (بنەڕەت: لە *kolokunthis* یۆنانی) ◌ حَنظَل

**cologne** /kə'ləʊn, US kə'loʊn/ *noun*
کۆلۆن، ئۆدوکلۆن (هەروەها eau de cologne "ئاوی کۆلن" "water of Cologne" (شارێکی ڕۆژاوای ئەڵمان "Köln") ◌ اودوکلن

**Colombian** /kə'lɒmbɪən/ *noun, adjective*
*n* خەڵکی کۆلۆمبیا، کۆلۆمبیایی *adj* سەربە یان پێوەندی بە کۆلۆمبیا یان خەڵکەکەیەوە هەیە، کۆلۆمبیایی ◌ کولومبیایی

**colon**[1] /'kəʊlən, US 'koʊ-/ *noun*
دووخاڵ، دووخاڵە، جووت(ە)خاڵ (نیشانەی «:») ◌ دونقطه، کلون

**colon**[2] /'kəʊlən, US 'koʊ-/ *noun*
کۆلۆن (بەشی خوارووی ڕیخۆڵەگەورە) ◌ قولون

**colón** /kɒ'lɒn/ *noun, pl.* colones /-'lɒnɛz/
یەکەی بنەڕەتی پارەی کاستاریکا و ئیل سالڤادۆر، بەرامبەر بە سەد centimo لە کاستاریکا و سەد centavo لە ئیل سالڤادۆر ◌ کالان

**colonel** /'kɜ:nl, US 'kɜ:rnl/ *noun*
کۆلۆنێل (= ئەفسەرێکی پایەبەرز لە ئەرتەش و هێزی ئاسمانی و دەریایی ئەمریکادا)؛ lieutenant colonel ◌ سرهنگ

**Colonel Blimp** = blimp

**colonelcy** /'kɜ:nəlsi/ *noun,* also colonelship
کۆلۆنێلی ◌ سرهنگی

**colonial** /kə'ləʊniəl, US -'loʊ-/ *adjective, noun*
1 *adj* داگیرکارییانە، ئیستعماری: *a colonial power* ◊ *Tunisia achieved independence from French colonial rule in 1956* 2 داگیرگەیی، کۆلۆنی، کۆلۆنیال 3 (سەربە) سەردەمی کۆلۆنیالیزم یا داگیرگەری 4 (بیناسازی یا شتومەکی نێومال) بە شێوازی سەروبەندی کۆلۆنییەکانی بریتانیا لە ئەمریکا بەرلە سەربەخۆیی 5 (لەمەڕ گیانەوەر یان ڕووەک) پوورەژی، کۆلۆنیژی *n* دانیشتووی کۆلۆنی، کۆلۆنینشین: *British colonials in India* (colonially *adj*) ◌ 1 *adj* 1 استعماری 2 مستعمراتی 3 (وابسته به) دوره‌ی استعمار 4 و 5 کولونیال *n* مهاجرنشین

**Colonial** /kə'ləʊniəl, US -'loʊ-/ *adjective*
سەربە ئەو کاتەی کە هێشتا ئەمریکا داگیرگە یان کۆلۆنی ئینگلتەرە بوو یا ئەو سێزدە کۆلۆنییە بنەڕەتییە کە ئەمریکایان دامەزراند: *the Clonial government of Vermont* ◌ کولونیال

**colonialism** /kə'ləʊniəlɪzəm, US -'loʊ-/ *noun*
داگیرگەری، داگیرکاری، کۆلۆنیالیزم: *European colonialism* ◌ استعمار

**colonialist** /kə'ləʊniəlɪst, US -'loʊ-/ *noun, adjective*
*n* داگیرگەر، داگیرکار، کۆلۆنیالیست: *The colonialists imposed war on the country* *adj* داگیرگەرانە، داگیرکارانە: *colonialist laws* (-nialistic *adj*) ◌ *n* استعمارگر *adj* استعماری

**colonic** /kə'lɒnɪk, US -la:n-/ *adjective*
(توێکاری) سەربە کۆلۆن، کۆلۆنی، پێوەندی بە کۆلۆنەوە هەیە ◌ وابسته به قولون

**colonist** /'kɒlənɪst, US 'ka:l-/ *noun*
داگیرگەنشین، کۆلۆنینشین، نیشتەجێی داگیرگە؛ کۆلۆنیست ◌ مهاجرنشین؛ کولونیست

**colonization** /ˌkɒlənaɪ'zeɪʃn, US ˌka:lənə'z-/ *noun*
داگیرگاندن، کۆلۆنیزاسیۆن، بەکۆلۆنیکردن، کۆلۆنیسازی؛ (ژینگەناسی) خۆجێگیرکردن (لە ئاقاری؛ colonized *adj*: داگیرگە، داگیرکراو، (بە)کۆلۆنیکراو؛ colonizer *n*: داگیرکار، داگیرگەر، کۆلۆنیزێر، کۆلۆنیساز؛ colonizing *adj*: داگیرکار، داگیرگەر) ◌ مستعمره‌سازی

**colonnade** /ˌkɒlə'neɪd, US ˌka:l-/ *noun*
ڕیزەکۆڵەکە، ڕیزەستوون، کۆڵەکەبەندی (بە یەک

ئەندازە و بۆ راگرتنی میچ؛ بنەرەت: لە فەرەنسی، لە *colonne* "ستوون"، لە *columna* لاتین) ⟡ ردیف ستون

**colonnaded** /ˌkɒləˈneɪdɪd, US ˌkɑːl-/ *adjective*

کۆڵەکەبەند، ریزەستوون(دار)، کۆڵەکەریز، (خاوەن)ریزەکۆڵکە، ستوونریز، ستوونبەند ⟡ دارای ردیف ستون

**colony** /ˈkɒləni, US ˈkɑːl-/ *noun, pl.* colonies

1 داگیرگە، کۆلۆنی 2 کۆچەران، کۆچبەران، مشەختان 3 کۆمەڵگا، کۆمەڵ، دەستە، گروپ 4 ناوچە 5 پێکەوەژی؟، پووروەژی، کۆلۆنی (کۆمەڵێ رووەک یان گیانەوەر کە لە هەمان شوێندا دەژین و شین دەبن؛ بنەرەت: لە لاتین *colonia* "farm settlement"، لە *colonus* "farmer settler"، لە *colere* "کێڵان، چاندن cultivate") ⟡ 1 مستعمره 2 مهاجران 3 اجتماع، گروه 4 منطقه 5 پرگنه، کولونی

**colophon** /ˈkɒləfən, US ˈkɑːl-/ *noun*

1 بەرژەنگ و نیشانەی بلاوکەرەوە 2 (وتەکانی) دوایین لاپەرەی کتێب، دواڕووپەڕ ⟡ 1 آرم 2 (مندرجات) صفحەی آخر کتاب

**colophony** /kəˈlɒfəni, US ˈkɒləˌfəʊni/ = rosin

**color** = US spelling of colour

**Colorado blue spruce** = blue spruce

**Colorado beetle** *noun.* also Colorado potato beetle or potato bug

قالۆنچەی کۆلۆرادۆ (= بەلای رووەکی پەتاتەیە، رەسەنی ئەمریکایە [*Leptinotarsa decemlineata*]) ⟡ سوسک کولورادو

**coloration** /ˌkʌləˈreɪʃn/ *noun*

(تکنیکی) رەنگاندن، رەنگبەندی، رەنگ رێکخستن، رەنگ، رەنگی سروشتی یان خۆرسکی: *the coloration of a butterfly's wing ◊ the dark coloration of his skin* ⟡ عمل رنگ کردن، رنگآمیزی، رنگ، رنگ طبیعی

**coloratura** /ˌkɒlərəˈtʊərə, US ˌkʌlərəˈtʊrə/ *noun*

1 کالیرۆتۆرا، کۆلیراتۆر 2 گۆرانیبێژی کۆلۆراتۆر ⟡ 1 کولوراتور 2 خوانندەی کولوراتور

**coloratura soprano** *noun*

گۆرانیبێژی کۆلۆراتۆر (ژن) ⟡ خوانندەی کولوراتور

**colorectal** /ˌkəʊləʊˈrɛkt(ə)l/ *adjective*

سەربە کۆلۆن و کۆم، کۆلۆکۆمی ⟡ کولورکتال

**colorific** /ˌkʌləˈrɪfɪk, US ˌkɒl-/ *noun*

1 (دەگمەن) رەنگاورەنگ، رەنگین، هەزاررەنگ 2 رەنگدەرەوە ⟡ 1 رنگارنگ 2 رنگآور

**colorimeter** /ˌkʌləˈrɪmɪtə, US ˌkɒl-/ *noun*

رەنگپێو ⟡ رنگسنج

**colorimetric** *adjective*

سەربە رەنگپێوی ⟡ وابستە بە رنگسنجی

**colorimetry** /ˌkʌləˈrɪmətri/ *noun*

رەنگپێوی ⟡ رنگسنجی

**color guard** *noun*

ئالاهەڵگران (- لە ئاهەنگێکی فەرمیدا) ⟡ پرچمداران

**colorist** = colourist

**color line** = colour bar

**colossal** /kəˈlɒsl, US kəˈlɑːsl/ *adjective*

1 زۆرگەورە، زەبەلاح، (وەک پارە) بێئەندازە زۆر، یەکجار زۆر، enormous: *a colossal statue ◊ The singer earns a colossal amount of money* 2 *a colossal failure* ◊ (پەیکەرتاشی) لانی کەم دوو بەرامبەری ئەندازەی ئاسایی 3 (بیناسازی) زیاتر لە نهۆمێکی کۆڵەکە و ستوونەکان ⟡ 1 عظیم، غولآسا، فوقالعادە 2 و 3 کولوسال

**colossally** /kəˈlɒsli, US kəˈlɑːsli/ *adverb*

یەکجار، لەڕادەبەدەر ⟡ فوقالعادە

**colosseum** = coliseum

**Colossians** *noun, pl.*

کۆلۆسیەنز: نامەیێکی نووسراوە لە لایەن سەینت Paul بۆ دیانی یان کریستیەنەکانی Colossae و کتێبێکە سەربە پەیمانی نوێ ⟡ کولوسینز

**colossus** /kəˈlɒsəs, US -ˈlɑːs-/ *noun, pl.* colossi /-saɪ/ or colossuses

کەڵەپەیکەر (لە لایەن هیرۆدۆتەوە Herodotus لەمەڕ پەرستگە میسرییەکانەوە بەکارهێنراوە)، کەڵ ⟡ مجسمەی بزرگ، غول

**colostomy** /kəˈlɒstəmi, US kəˈlɑːs-/ *noun, pl.* colostomies

کۆلۆستۆمی: 1 نەشتەرگەری تێکردنی کونێکی دەسکرد لە کۆلۆن بۆ دەرەوەی لەش (رێگایێکە بۆ دەرچوونی شتی نێو ریخۆڵە) 2 کونێ بەو شێوەیە تێ کراوە ⟡ کولوستومی

**colostrum** /kəˈlɒstrəm, US -ˈlɑːs-/ *noun*

(لاتین) فرچک، ژەک، فرو، زەها، خرندۆڵ، لیوە، فریش(ک) ⟡ شیرماک

**colour** /ˈkʌlə(r)/ *noun, adjective,* US color

*n* 1 رەنگ 2 رەنگی پێست 3 سووری و گەشاوەیی سەروچاو 4 (colours) ئالا 5 روالەت، رووکار 6 دڵرفێنی، وروژان، سەرنجراکێشی 7 نژاد، رەگەز 8 تینوگوڕ، کەفوکوڵ *adj* رەنگی، نژادی (بنەرەت: لە *colour* (ناو)، *colourer* (کار) فەرەنسی کۆن، لە *color* لاتین (ناو)، *colorare* "کار verb") ⟡ *n* 1 رنگ 2 رنگ پوست 3 سرخی پوست 4 (در جمع) پرچم 5 ظاهر 6 جذبە 7 نژاد 8 شور و حال *adj* رنگی، نژادی

**colourable** *adjective*
1 رەنگ دەکرێ، رەنگ دەگرێ، لەڕەنگ‌هاتوو 2 درۆزنە، قەڵب، ساختە، چرووک، فرت‌وفێڵاوی، زرک، هەڵخەڵەتێنەر، فریودەر، ڕواڵەت‌جوان ۞ 1 رنگ‌پذیر 2 جعلی، فریب‌آمیز

**colourant** *noun*
رەنگ (رەنگ‌کردن) ۞ رنگ رنگ‌آمیزی

**colouration** = coloration

**colour bar** *noun*
جیاوازی‌دانان (رەگەزی) ۞ تبعیض نژادی

**colour-bearer** *adjective*
ئالاهەڵگر ۞ پرچم‌دار

**colour-blind** *adjective*
رەنگ‌کوێر ۞ کوررنگ

**colour-blindness** *noun*
رەنگ‌کوێری ۞ رنگ‌کوری

**colour-coded** *adjective*
بە رەنگی جیاواز ۞ با رنگ متفاوت

**coloured** /'kʌləd, US -ərd/ *adjective, noun*
*adj* 1 (زۆرتر لە لێکداندا) رەنگی، نەخشین، بە رەنگی، ـرەنگ، باو، ئامال، مەیلەو: *brightly* *ash-* ◊ *coloured lights* ◊ *coloured balloons* *coloured hair* 2 (Coloured، لە ئەفریکای باشووری) دوورەگە، دوورە، رەنگین‌پێست *n* کەسێکی دوورەگە یان رەنگین‌پێست ۞ *adj* 1 رنگی، به رنگ 2 دورگه *n* آدم دورگه

**colourfast** *adjective*
خۆرەنگدار، کاڵەوەنەبوو، جێگیررەنگ، یەک‌ڕەنگ، رەنگ‌نەڕوێشتوو ۞ دارای رنگ ثابت

**colourful** /'kʌləfl, US -ərfl/ *adjective, US* colorful
1 رەنگاورەنگ، پڕرەنگ، رەنگین: *colorful scenery* 2 بەتین، بەگوڕ، بەجۆش، وورووژێنەر، هەژێنەر، سەرنج‌ڕاکێش 3 هەمەڕەنگ، جۆراوجۆر 4 بریقەدار، درەوشاوە، زەرقی، رووناک ۞ 1 رنگارنگ 2 پرشور، مهیج، جذاب 3 متنوع 4 درخشان

**colourfully** /'kʌləfli, US -ərfli/ *adverb*
1 رەنگاورەنگ 2 سەرنج‌ڕاکێشانە ۞ 1 رنگارنگ 2 به طور جذاب

**colourfullness** /'kʌləflnəs, US -ərflnəs/ *noun*
1 رەنگاورەنگی 2 سەرنج‌ڕاکێشی ۞ 1 رنگارنگی 2 جذابیت

**colouring** /'kʌlərɪŋ/ *noun*
1 رەنگ 2 رەنگ‌کردن، رەنگ‌لێدان، رەنگاندن، رەنگ‌کاری 3 لێکدانی رەنگەکان 4 رەنگ‌وروو، روخسار، شێوە 5 مەتریاڵی رەنگی ۞ 1 رنگ 2 عمل رنگ کردن، رنگ‌زنی 3 رنگ‌آمیزی 4 چهره، ظاهر 5 مادەی رنگی

**colourist** /'kʌlərɪst/ *noun, especially US* colourist
کالیریست، رەنگ‌ڕێکخەر (ئارتیست یان رازێنەر) ۞ کالریست

**colourless** /'kʌlələs, US -lərl-/ *adjective*
1 بێ‌ڕەنگ، کاڵ 2 رەنگ‌بەڕیو، رەنگ‌هەڵبزرکاو 3 ناسەرنج‌ڕاکێش، وەڕەسکەر، جاڕسکەر ۞ 1 بی‌رنگ 2 رنگ‌پریده 3 بی‌روح، ملال‌آور

**colour printing** *noun*
چاپی رەنگی ۞ چاپ رنگی

**colours** *noun, pl.*
1 ئالا: *Spain's national colours* 2 نیشان، بەرژەنگ 3 روخسار، دەم‌وچاو، شێوە 4 هێزە چەکدارەکان 5 بۆچوون، را، دیتن، نێرین ۞ 1 پرچم 2 آرم 3 سیما 4 نیروهای مسلح 5 عقیده

**colour scheme** *noun*
لێدانی رەنگەکان، رەنگ‌بەندی، رەنگ تێکەڵ‌کردن ۞ رنگ‌آمیزی

**colour supplement** *noun*
باشکۆی رەنگی (کۆڤار، رۆژنامە و هتد) ۞ ضمیمەی رنگی

**colourway** /'kʌləweɪ, US -lərw-/ *noun*
تێکەڵ‌کردنی رەنگ، لێکدانی رەنگ، رەنگ‌بەندی ۞ ترکیب رنگ

**colpitis** *noun*
ئاوسانی نێولەش، گولنگ‌ئاوسان ۞ التهاب مهبل

**colportage** /'kɒl,pɔːtɪdʒ/ *noun*
کتێب‌فرۆشی گەڕۆک ۞ کتاب‌فروشی دوره‌گرد

**colporteur** /'kɒl,pɔːtə, US ,kɒlpɔː'təː/ *noun*
کتێب‌فرۆشی گەڕۆک ۞ کتاب‌فروش دوره‌گرد

**colposcope** /'kɒlpəskəʊp/ *noun*
مناڵدان‌بین، کۆلپۆسکۆپ (= ئامێرێ بۆ تاقی‌کردنەوەی نێوگیان و ملی مناڵدان؛ بنەڕەت: لە *kolpos* یۆنانی "womb" + -scope) ۞ کولپوسکوپ

**colposcopy** /kɒl'pɒskəpi/ *noun*
مناڵدان‌بینی، کۆلپۆسکۆپی ۞ کولپوسکوپی

**colt**[1] /kəʊlt, US koʊlt/ *noun*
1 جوانوو، جانی، کوریشک، کوڕگ، بیچووە ئەسپ (ب.ت. ئەوەی کەم‌تر لە چوار ساڵ بێ) 2 لاوی بێ‌ئەزموون (ب.ت. ئەندامی تیمی لاوان، وەرزش) ۞ 1 کره اسب 2 جوان بی‌تجربه

**colt**[2] /kəʊlt, US koʊlt/ *noun*
کۆلت، شەش‌تیر (بنەڕەت: لە ساڵی 1835 لە لایەن Samuel *Colt* (1814-1862) ئەمریکایی‌یەوە دروست کرا) ۞ کلت

**colter** /'kəʊltə(r)/ = coulter

**coltish** /'kəʊltɪʃ, US 'koʊlt-/ *adjective*
1 جوانووئاسا، جوانوویی، سرک 2 بەکەیف، بەدەماغ، بەگوڕ، چابک، frisky، playful: *coltish antics* ۞ 1 کره‌مانند 2 سرزنده

**coltishly** /ˈkəʊltɪʃli, US ˈkoʊlt-/ *adverb*
بەکەیفەوە، بەگوڕەوە، بەدەماخەوە ◌ باسرزندگی

**coltishness** /ˈkəʊltɪʃnəs, US ˈkoʊlt-/ *noun*
بەکــەیفی، گەشــی، بــەگوڕی، بــەدەماخی ◌ سرزندگی

**coltsfoot** *noun, pl.* coltsfoots
(ڕووەکناسی) پێکەرە، پاکەرانە، پێجوانوو، ڕووەکێکی خێزانی daisy، بە گوڵــی زەرد و گەڵای زلەوە [*Tussilago farfara*] ◌ پای خر

**colubrid** /ˈkɒljʊbrɪd/ *noun, adjective*
(گیانەوەرناسی) جۆرێ ماری خێزانێکی زۆر بەربڵاو (Colubridae)، ئەو تیرەیە زۆربەی مــارە بــێوەیــەکان harmless پێکــدێنن، وەک grass snake ◌ نوعی مار

**colubrine** /ˈkɒljʊbraɪn/ *adjective*
ماری، مارئاسا، مارانە، شێوەمار، لە مار دەچێ؛ ســەربــە colubrid ـەکــان (بنــەڕەت: لــە *colubrinus* لاتین، لە *coluber* ـەوە بە واتای مار snake) ◌ مارمانند

**colugo** /kəˈluːgəʊ/ = flying lemur

**columbarium** /ˌkɒl(ə)mˈbɛːrɪəm/ *noun, pl.* columbaria
گۆڕخانــەی کۆترخــانی، ژێرخــان یــان جێگــای ڕاگرتنی (خۆڵەمێشی) مردووان (لە لاتینــەوە بە واتای کۆترخان) ◌ دخمەی مردگان

**Columbia** = the United States

**Columbian** *adjective*
سەربە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یان کریستوفێر کۆلۆمبۆس Christopher Columbus ◌ وابستە بە امریکا یا کریستوفر کلمبوس

**columbine** /ˈkɒləmbaɪn, US ˈkɑːl-/ *noun*
(ڕووەکناسی) یەزانبەرس، کۆترە (بنەڕەت: لە *columba* لاتین "dove") بە گوڵی شینی مەیلەو ئــەرخــەوانی [*Aquilegia vulgaris*] و جــۆرە پێوەندیدارەکان] ◌ تاج‌الملوک

**columbite** /kəˈlʌmbaɪt/ *noun*
کــانێکی ڕەش کــە ئۆکســایدی ئاســن، مەنگــەنیز manganese، نیۆبیــۆم و تانتــالۆمی tantalum تیایە (لە columbium + ˈite-) ◌ کولومبیت

**columbium** /kəˈlʌmbɪəm/ *noun*
(کیمیا) کۆلۆمبیۆم (niobiumباوترە) ◌ کولومبیم

**Columbus Day** *noun,* also Discovery Day
1 ڕۆژی کۆلۆمبــــۆس (یــــان دۆزینــــەوە): دوازدەیەمی ئۆکتۆبر کە جاران وەک ڕۆژێکی پشووی قانوونی یان فەرمی لە زۆر هەرێمی ئــەمریکا بــە یــادی دابــەزینی کۆلۆمبۆس لــە Bahamas لە 1492 ڕەچاو دەکرا 2 دووهەمین دووشەممەی ئۆکتۆبر کە جاران وەک پشووێکی قانوونی لە زۆر هەرێمی ئەمریکا ڕەچاو دەکرا ◌ روز کلمبوس

**columella** /ˌkɒljʊˈmɛlə/ *noun, pl.* columellae /-liː/
(گیانەوەرناسی و ڕووەکناسی) ستوونچــە، ستوونیژە ◌ کولوملا

**columellar** *adjective*
ســتوونچــەیی، ســەربە یــان پێــوەنــدی بــە ستوونچەوە هەیە ◌ وابستە بە کولوملا

**column** /ˈkɒləm, US ˈkɑːləm/ *noun*
1 کۆڵــەکە، ســتوون، ئەســتوون، تــەژە: *The temple is supported by marble columns* 2 شتێک لە شێوەی ستوون: *a column of smoke* (ستوونێکی دووکەڵ)، *a column of water* 3 ستوون، ڕیز، هێڵ: *a dictionary with two column of text* ◊ *columns per page* (*abbreviation* col.) *a* (پەڕەی) 4 ستوون (ژمارە)، ڕیز: *the gossip/financial* ◊ *column* و personal column (بڕوانە agony column) 5 ستوون، ڕیز: *to add up a long column of figures* (column ◌ ستون، *column of troops and tanks* صف، ردیف، خط

**columnar** /kəˈləmnə(r)/ *adjective*
کۆڵەکەیی، ئەستوونی، ستوونی ◌ ستونی

**column diagram** *noun*
هێڵکاری یان دیاگرامی (ئە)ستوونی ◌ نمودار ستونی

**columnated** /ˈkɒl(ə)mneɪtɪd/ *adjective*
کۆڵــەکەدار، کۆڵــەکەڕیز، ســـتوونســـتوون، ستووندار ◌ ستون‌دار

**columned** *adjective*
کۆڵــەکەدار، کۆڵــەکەڕیز، ســـتوونســـتوون، ستووندار ◌ ستون‌دار

**columniation** *noun*
کۆڵــەکەڕا، ســتوونبەنــدی، کۆڵــەکەڕیزکردن، ســـتوونەڕا (بــــەکارهێنانی کۆڵـــەکەکان و ڕێکخــستنیان لە خانووبەرەدا) ◌ کالیومنیاسیون

**columnist** /ˈkɒləmnɪst, US ˈkɑːl-/ *noun*
1 ســتوونــووس، وتارنووس، گوتارنووس: *a political* ◊ *gossip/newspaper columnist* 2 ڕۆژنامــەنووس (لە ڕۆژنامــە یــان گۆڤار)؛ *columnistic adj* (columnistic ◌ 1 مقالنویس 2 روزنامەنویس

**coly** /ˈkəʊli/, *pl.* colies = mousebird

**colza** /ˈkɒlzə/ *noun,* also rape
1 (ڕووەکناسی) کۆلزا، گیارۆنە 2 = rapeseed ◌ کولزا

**com-** /(also co-, col-, con-, or cor-) *prefix*
پێشگر: پێکەوە، پێک، لێک (بنەڕەت: لە *cum* لاتین) ◌ پیشوند: با هم

**coma**[1] /ˈkəʊmə, US ˈkoʊmə/ *noun*
بووراننــەوە، بــێهۆشــی، لەســەرخۆچوون، قەیوورسین، لەبڕ: *to go into/be in a coma*

 اغما

**coma**[2] /'kəʊmə, US 'koʊmə/ *noun, pl.* comae /-mi:/
تەم یان گازێکی بڵاوەبوو لە دەوری ناوەڕاستی ئەستێرەیێکی کلکدار، مووسەرە (بنەڕەت: لە *komē* یۆنانی "مووی سەر") ❂ کوما

**Coma Berenices** *noun*
(ئەستێرەوانی) قژ یان مووی بێرێنیسیز، پرچی بێرێنیس: کۆئەستێرەیێ لە باکووری Virgo نێوان Boötes و Leo ❂ شعر البرنوس

**Comanche** /kə'mantʃi/ *noun, pl.* same or Comanches
1 کۆمانچی: ئەندامی گەلێکی سووریێستی باشووری ڕۆژاوای ئەمریکا 2 زمانی Uto-Aztecanی ئەو گەلە (بنەڕەت: سپانیایی، لە کۆمانچییەوە) ❂ کومانچی

**Comanchean** *adjective*
کۆمانچیایی، کۆمانچیەن: سەربە سەردەمی نێوان ژووراسیک Jurassic و کریتاسە Cretaceous و کەڤر و بەردی سەربەو سەردەمە ❂ کومانچین

**comate** /kəʊmeɪt/ *noun*
ڕفیق، ڕەفیق، دۆست، هاوڕێ، companion؛ hairy، tufted ❂ رفیق

**comatose** /'kəʊmətəʊs, US 'koʊmətoʊs/ *adjective*
1 لە کۆمادا، بێهۆش، بێسەروزمان، بووراوە، لەسەرخۆچوو 2 (بە شۆخی) خەوالوو 3 سست، خاو، داوەشاو، داهێزراو، داگیراو، چاوبەخەو، (comatosely *adv*) torpid ❂ 1 در حالت اغما 2 خوابآلوده 3 بیحال

**comatulid** *noun*, also comatula (pl. comatulae)
جۆرێ crinoid کە لە قووڵاییەکانی دەریادا ئازاد مەلە دەکا ❂ کوماتیولید

**comb** /kəʊm, US koʊm/ *noun*
1 شانە، ڕنەک، چلچنگ، کەلکیت، دەفە، کوویشک، لیفە، ڕەنوونە، کەرکیت 2 شانە هەنگوین 3 پۆپە، کاکۆڵ 4 شانەکردن، داهێنان، شیکردنەوە ❂ 1 شانە، دفتە 2 شانەی عسل 3 تاج (خروس) 4 شانەزنی

**combat** /'kɒmbæt, US 'kɑ:m-/ *noun, adjective*
*n* شەڕ، جەنگ، هەرف، سواژ، مەیدانداری، نەبەرد، خەبات، شەڕوکێشە پێکهەڵپڕژان پێکادان ئاوقەی یەکبوون بەگژیەکداچوون تێکهەڵچوون *adj* شەڕی، جەنگی ❂ *n* نبرد، جنگ، درگیری، نزاع *adj* جنگی، رزمی

**combatant** /'kɒmbətənt, US 'kɑ:m-/ *noun, adjective*
*n* شەڕکەر، شەڕڤان، خەباتگێڕ *adj* شەڕی، جەنگی ❂ *n* رزمندە، محارب *adj* جنگی، جنگجو

**combat fatigue** *noun*
فاتیگ یان دەروونپەشێوی شەڕ ❂ روانرنجوری جنگ

**combative** /'kɒmbətɪv, US 'kɑ:m-/ *adjective*
1 شەڕانی، لاسار، جینگزی، کەللەڕەق: *in a combative mood/spirit* 2 ئامادەی شەڕ، سەرلەشەڕخوراو: *in a combative mood* (combatively /'kɒmbətɪvli, US 'kɑ:m-/ *adv*: شەڕکەرانە؛ combativeness /'kɒmbətɪvnəs, US 'kɑ:m-/ *n*: شەڕکەری، شەڕڤانی) ❂ 1 دعوایی، ستیزەجو 2 مستعد جنگ

**comb-case** *noun*
شانەدان، جێشانە ❂ شانەدان

**combe** /ku:m/ *noun*, also coomb, coombe
1 شیوی باریک یان تەسک (ب.ت. لە باشووری ئینگلتەرە) 2 (زەویناسی) دۆڵێکی وشک لە تەلاتێکی گەچی یان بەردەقسلی ❂ 1 درەی باریک 2 کوم

**comber**[1] /'kəʊmə/ *noun*
شیکەرەوە، شیکەنە، دەزگای شیکردنەوە ❂ شانەزن، ماشین حلاجی

**comber**[2] /'kəʊmə/ *noun*
جۆرێ ماسی کەناری دەریایی [ *Serranus cabrilla*] ❂ نوعی ماهی

**combi** *noun*
دەزگای چەندکارە ❂ دستگاه چندمنظورە

**combination** /ˌkɒmbɪ'neɪʃn, US ˌkɑ:m-/ *noun*
1 لێکدان، پێکەوەبەستن، پێکەوەبەستراوی، یەکگرتوویی، هەڤدودانین، تێکەڵکردن، یەکگرتن، پێکهێنان 2 هاوبەندی 3 تێکەڵە، ئاوێتە 4 کۆمەڵە، گرووپ، کۆمەڵ 5 یەکخستن، تێکهەڵکێشان 6 ڕەمز، قوفڵی ڕەمزی، قوفڵی ژمارەیی 7 مۆتۆڕ لەگەڵ سەوەتە یان یەدەکەکەی (combinational *adj*) ❂ 1 ترکیب، اتحاد 2 ائتلاف 3 آمیزە 4 مجموعە، گروە 5 تلفیق، اشتراک 6 رمز 7 موتورسیکلت یدکدار

**combination force** *noun*
هێزی یەکگرتن ❂ قوەی اتحاد

**combination lock** *noun*
قوفڵی ڕەمزی یان ژمارەیی ❂ قفل رمزی

**combinations** *noun, pl.*
جلی بنەوە، بەرگی ژێرەوە ❂ لباس زیر

**combine** /'kɒmbaɪn, US 'kɑ:m-/ *noun*
1 یەکگرتن، یەکگرتوویی 2 هاوبەندی 3 کارتێل، تراست 4 دەزگای دوورینەوە ❂ 1 اتحاد 2 ائتلاف 3 کارتل، تراست 4 کمباین

**combined** *adjective*
1 یەکپارچە 2 یەکگرتوو، یەکخراو، هاوبەش، تێکڕایی، پێکەوە ❂ 1 سرهم 2 متحد، مشترک

**combined operations** *noun, pl.*
کـرداری هاوبـەش (بـە هاوبەشـی هێزەکـانی دەریایی، ئاسمانی و زەمینی) ◌ عملیات مشترک
**combine harvester** *noun,* also combine
دەزگای دوورینەوە، درەوکە، کومباین ◌ کمباین
**combings** *noun, pl.*
ئەو بـرە قژەی کە بە دەم شانەکەوە هاتوتـەوە، دەمەشانە، سـەرشە، سەرشانە، لیسپەشانە، بەرشانە ◌ کامبینگس
**combining form** *noun, abbreviation* comb.form
(ڕێزمـان) پاشـگر و پێـشگر، شـێوگی لێکـدەر، وشەی لێکدەر (ب.ن. *-bio* "ژیان" لە *biology* دا یـان *-cephal* لـە *cephalic* دا) ◌ صـــورت ترکیب‌ساز
**combless** *adjective*
بێ‌پۆپە، بێ‌کاکۆڵ ◌ بی‌تاج
**combo** /'kɒmbəʊ, US 'kɑːmboʊ/ *noun, pl.* combos
1 کۆمبـۆ (سـازبەندیکی چکۆلانـە کـە جـاز یـان مـوزیکی هەڵـبەرکێ لێـدەدەن) 2 ئامپلیفایـەری گیتاری کە سپیکێرەکەی پێوەیە (تا ئەوەی کە بە جیا بێ) 3 = combination ◌ کومبو
**combustibility** /kəm,bʌstə'bɪlətɪ/ *noun,* also combustibleness
لەسـووتان‌هـاتوویی، بـسووتی، گرکێـشی، گڕالـی ◌ قابلیت احتراق یا اشتعال
**combustible** /kəm'bʌstəbl/ *adjective, noun*
*adj* 1 لەسووتان‌هاتوو، بسووت، گرکێش، گڕال 2 جینگـزی، سـەرگەرم، زووتـووڕە، فیـشەکی، ئالـەتی، هەڵـتۆز، سـەرتوند: *a combustible temper* *n* (combustibles) گرەمـــــــەنی، ســـووتەمەنی، کـــەرەســـە یـــان مەتریالـــە لەسووتان‌هاتووەکان ◌ *adj* 1 قابـل احتـراق یـا اشتعال 2 آتشی *n* مواد محترقه
**combustion** /kəm'bʌstʃən/ *noun*
1 ســـووتان، گـــرگرتن، گرکێـــشان، گـــڕیان، ئاگرتێبەربوون 2 (کیمیا) تێکەڵبوونێکی کیمایی خێـرا لـەگـەڵ ئۆکـسیژێن کـە لـەودا گـەرمـا و ڕۆشـنایی بـەرهـەم دێ 3 (ئـەسـتێرەوانی) زۆر نزیک بە خۆر 4 = tumult ◌ 1 اشتعال، احتراق 2 کامبیوستیون 3 خیلی نزدیک به خورشید
**combustion chamber** *noun*
سووتانگە، ژووری سووتان ◌ محفظه‌ی احتراق
**combustion point** *noun*
خاڵی سووتان ◌ نقطه‌ی احتراق
**combustor** *noun*
سـووتانگە، ژووری سـووتان (لـە توربینی گـازی یان مۆتۆری جێت) ◌ محفظه‌ی احتراق
**come**[1] /kʌm/ *interjection*
دەس‌هەڵگرە، لە کۆڵ بەوە، لێیەوە ◌ دست وردار
**come**[2] /kʌm/ *noun*
(نافەرمی) تۆواو semen (ئەڵمانی‌بنەڕەت) ◌ منی
**come**[3] /kʌm/ = past participle of come
**come-and-go** *noun*
هام‌وشۆ، هات‌وچۆ ◌ آمد و شد، تردد
**comeback** /'kʌmbæk/ *noun*
1 گەڕانەوە (بۆ دۆخی سـەرکەوتووانەی جـاران)، پاش‌داچوون 2 (نافەرمی) وەڵامی توند یـا گـرژ، 3 retort زیان‌دانەوە، بۆبژاردن ◌ 1 بازگـشت 2 جواب دندان‌شکن 3 جبران
**COMECON** *abbreviation* Council for Mutual Economic Assistance
کۆمیکـۆن: ئـەنجومـەنی یارمـەتی ئـابووری دوولایەنە ◌ کمکون
**comedian** /kə'miːdɪən/ *noun*
ئەکتەری کۆمیدی، بەزمی، تیزەجاڕ: *a stand-up comedian* ◌ کمدین
**comedic** /kə'miːdɪk, -'mɛ-/ *adjective*
سەربە کۆمیدی (comedically *adv*) ◌ وابسته به کمدی
**comedienne** /kə,miːdɪ'en/ *noun*
ئەکتـەری کۆمیـدی، بـەزمی (ژن) ◌ هنرپیـشەی کمدی
**comedo** /'kɒmɪdəʊ, US kə'miːdəʊ/ *noun, pl.* comedones /-'dəʊniːz/ = technical term for blackhead
**comedown** /'kʌmdaʊn/ *noun*
1 (نافـەرمـی) داچـوون، داشـکان، لـێ‌کـەوتن، دابەزین 2 مایەی داشکان و سووکی، شان‌کەچی ◌ 1 افول، افت 2 کسر شأن
**comedy** /'kɒmədi, US 'kɑːm-/ *noun, pl.* comedies
1 کۆمیـدی، بەزمەسـات: *Dante's Divine Comedy* 2 شانۆ 3 فیلم یان چیرۆکی کۆمیدی ◌ 1 کمدی 2 نمایش 3 فیلم یا داستان کمدی
**commedy of manners** *noun*
کۆمیـدی رەخنـەیی‌ـکۆمەڵایـەتی ◌ کمـدی انتقادی‌ـاجتماعی
**come-hither** *adjective*
سەرنج‌ڕاکێش، ناز: *that come-hither look in your eyes* ◌ لوند، جالب
**comeliness** /'kʌmlinəs/ *noun*
سەرنج‌ڕاکێشی، دڵڕفێنی ◌ جذابیت
**comely** /'kʌmli/ *adjective* (comelier, comeliest)
خوێن‌شیرین، ڕەزاسووک، جوان، دڵڕفێن، شیرین، سەرنج‌ڕاکێش، attractive ◌ ملیح، جذاب
**come on** *interjection*
یاڵلا، زووکە ◌ بجنب
**come-on** *noun, adjective*

*n* تەفرەدان، هەڵفریواندن، فریودان، لەخشتەبردن
*adj* تەفرەدەرانە ۞ *n* اغواگری *adj* اغواگرانه

**come-on** *noun*, give someone the come-on
ڕێگەدان ۞ چراغ زدن

**come-outer** *noun*
چاکسازیخواز ۞ اصلاح‌گر

**comer** /'kʌmə(r)/ *noun*
1 وادێ، هاتوو، دادێ: 2 *welcomed all comers*
مرۆڤی سەرکەوتن‌خواز: *The event is open to all comers* ۞ 1 آینده 2 آدم طالب موفقیت

**comestibles** /kə'mestɪblz/ *noun, pl.*
خواردەمەنی ۞ مأکولات

**comet** /'kɒmɪt, US 'kɑ:mət/ *noun*
ئەستێرەی کلکدار، پرچنە، پرچدرێژە: تەنێکی ئاسمانی celestial body کە لە ناوک یان کرۆکێکی سەهۆڵ و تۆز پێکهاتووە ( cometary *adv*) ۞ ستارەی دنباله‌دار

**comet family** *noun*
(ئەستێرەوانی) خێزانی کلکدار ۞ خانوادەی دنباله‌دار

**comet group** *noun*
(ئەستێرەوانی) کۆمەڵی کلکدار ۞ گروه دنباله‌دار

**cometic** /kə'metɪk/ *adjective*, also cometary
سەربە یان پێوەندی بە ئەستێرەی کلکدارەوە هەیە ۞ وابسته به دنباله‌دار

**comets** *noun, pl.*
کلکداران، کلکدارەکان، پرچنان ۞ دنباله‌داران

**come-uppance** /kʌm'ʌpəns/ *noun*
(نافەرمی) سزا، سزادان (کردەوەکان) ۞ مکافات

**comfit** /'kʌmfɪt/ *noun*
شیرینی، نوقڵ (کاکەڵە، دان، میوە و شەکرپێوەکراو) ۞ شیرینی

**comfort** /'kʌmfət, US -fərt/ *noun*
1 تەناهی، ئاسایش، ئاسوودەیی، حەساوەیی 2 دڵنەوایی، دڵخۆشی، دڵدانەوە، خەمڕەوێن، مایەی دڵخۆشی 3 کەلوپەلی ئاسوودەیی ۞ 1 راحتی، رفاه 2 تسلی، مایەی تسلی 3 لوازم رفاهی

**comfortable** /'kʌmftəbl, BrE also -fət-, also -fərt-/ *adjective*
1 ئاسوودە، تەناهـ حەساوە، راحەت، خۆش، خۆش‌گوزەران 2 خەمڕەوێن، مایەی دڵخۆشی 3 زیاد، زۆر 4 تەواو (داهات؛ comfortableness *n*: ئاسوودەیی، ئاسانی، راحەتی، تەناهی) ۞ 1 راحت، اسوده، مرفه 2 تسلی‌بخش 3 وافر 4 کافی (درآمد)

**comfortably** /'kʌmftəbli, -fət-, US -fərt-/ *adverb*
بە ئاسوودەیی، ئاسوودە، بە ئاسانی، ئاسان: *They are comfortably ahead in the opinion polls* ۞ به راحتی

**comfortably off** *adjective*
حەساوە، خۆش‌گوزەران، لە ئاسایشتدا، دەوڵەمەند ۞ مرفه

**comforter** /'kʌmfətə(r), US -fərt-/ *noun*
1 دڵدەرەوە، خەمڕەوێن، دڵخۆشیدەرەوە 2 لێفە، نوێن 3 مەمکەمژە، مەشقوولەک ۞ 1 آدم تسلی‌دهنده 2 لحاف 3 پستانک

**comforting** /'kʌmfətɪŋ, US -fərt-/ *adjective*
دڵدەرەوە، دڵخۆشیدەرەوە، دڵنەوایی‌کەر، خەمڕەوێن: *her comforting words* ( comfortingly /'kʌmfətɪŋli, US -fərt-/ *adv*) ۞ تسلی‌بخش

**comfort station** *noun*
دەستاوی گشتی، دەس‌بەئاو یان ئاودەستخانەی گشتی ۞ مستراح عمومی

**comfrey** /'kʌmfri/ *noun, pl.* comfreys
(ڕووەکناسی) گوێ‌مانگا، بەزکوژ، گاگۆرال [*Symphytum officinale* و جۆرە پێوەندیدارەکان] ۞ گوش خر، سمفیتون

**comfy** /'kʌmfi/ *adjective* (comfier, comfiest)
ئاسوودە، خۆش، راحەت، حەساوە ( comfily /'kʌmfɪli/ *adv*) ۞ راحت

**comic** /'kɒmɪk, US 'kɑ:mɪk/ *adjective, noun*
*adj* پێکەنینی، بەزمەساتی، گاڵتەجار، سەربە کومێدی: *a comic actor* *n* ئەکتەری کومێدی، کومیدیەن، کۆڤاری پێکەنینی وێنەدار (ی منالان) ۞ *adj* خنده‌دار، وابسته به کمدی *n* هنرپیشەی کمدی، مجلەی فکاهی مصور

**comical** /'kɒmɪkl, US 'kɑ:m-/ *adjective*
1 پێکەنینی، گاڵتەباز 2 (کۆن) سەربە کومێدی (comicality *n*) ۞ 1 مضحک 2 وابسته به کمدی

**comically** /-kli/ *adverb*
پێکەنینانە، بەشێوەیێکی پێکەنینی ۞ بە طور مضحکی

**comic book** *noun*
(لە ئەمریکا) کۆڤاری پێکەنینی وێنەدار (منالان) ۞ مجلەی فکاهی مصور

**Comice** /'kɒmɪs/ *noun*
کۆمیس، کامیس: جۆرێ دارهەرمێی دەشتی درەنگ‌بەری گەورەی زەرد ۞ کامیس

**comic opera** *noun*
ئۆپێرای پێکەنینی ۞ اپرای خنده‌دار

**comics** *noun, pl.*
بەشی وێنە پێکەنینی‌یەکان (ڕۆژنامە) ۞ بخش فکاهی

**comic strip** *noun*
چیرۆک یان داستانی پێکەنینی وێنەدار ۞ داستان فکاهی مصور

**coming** /'kʌmɪŋ/ *noun, adjective*

*With the -ng of modern* :هاتن، گەیشتن *n*
*adj technology, many jobs were lost*
*in the coming* :دوایی، داهاتوو، دادێ، دواتر
*This coming Sunday is her ◊ months*
*birthday* ◌ *n* آمدن، ورود *adj* آینده، بعد

**Comintern** *noun*
کۆمینتێرن: نێونەتەوەکانی کۆمۆنیستی، لە 1919 دامەزرا و لە 1943 هەڵوەشایەوە (بنەڕەت: لە ◌ (*Kom*munisticheskiĭ *Interna*tsional کومینترن

**comital** /'kɒmɪt(ə)l/ *noun*
(زۆرتر مێژوویی) سەربە count یان carl ◌ کومیتال

**comitia** /kə'mɪʃi:ə/ *noun*
(لە ڕۆمی کۆندا) ئەنجومەن، کۆمیشیا ◌ مجلس

**comity** /'kɒmɪti/ *noun, pl.* comities
ڕەوشت، نەزاکەت، ئەدەب؛ comity of nations ◌ ادب، مجامله

**comity of nations** *noun*
(لەبەرچاو) گرتنی ڕێز بۆ داب‌ونەریت و قانوو(نەکا)نی نەتەوەکان یان دەوڵەتەکان (یان وڵاتەکانی تر)، (لەبەرچاو) گرتنی ڕەوشت و نەزاکەتی نێونەتەوەیی؛ ئەو وڵاتانەی کە بەم شێوەیە دەجووڵێنەوە ◌ رعایت احترام نسبت به رسوم و قوانین ملت‌ها یا کشورها، مراعات آداب و نزاکت بین‌المللی؛ کشورهایی که به رسوم و قوانین یکدیگر احترام می‌گذارند

**comma** /'kɒmə, US 'ka:mə/ *noun*
1 بۆر، کاما 2 (موسیقا) کاما 3 جۆرێ پەپوولەی بەربڵاو بە باڵی قاوەیی یان پرتەقاڵی‌یەوە و بوونی نیشانەیێکی بۆرئاسای سپی لەسەر لای باڵەکانی دواوە [*Polygonia c-album*] ◌ 1 ویرگول 2 و 3 کاما

**comman** *noun*
دەس‌بەسەراگرتن، مەهار، ڕاگیرکاری، کۆنترۆڵ ◌ مهار

**command** /kə'ma:nd, US kə'mænd/ *noun*
1 دەستوور، فەرمان، فەروار: *Begin when I* *give the command* 2 (کامپیوتێر) دەستوور، فەرمان: *What is the startup command for the program?* 3 فەرمانداری، فەرماندەری، سەرکردایەتی 4 کەرت، یەکینە، یەکە 5 کاربەدەستان، فەرماندەران، سەرکردەکان 6 دەسەڵات، سەردەستی، باڵادەستی، زاڵی، سواری، کۆنترۆڵ، چاودێری، هێزبێ‌شکان: *his* *command of English* ◊ *He has 1200 men under his command* ◊ *The police arrived and took command of the situation* ◌ 1 دستور، امر 2 (کامپیوتر) دستور 3 فرماندهی 4 یکان، یگان 5 مقامات، فرماندهان 6 سلطه، چیرگی، تسلط، کنترل، نظارت، تبحر، احاطه

**commandant** /'kɒməndænt, US 'ka:m-/ *noun*
فەرماندار، فەرماندەر، سەرکردە ◌ فرمانده

**commandantship** /ˌkɒmən'dæntʃɪp/ *noun*
فەرمانداری، سەرکردایەتی، فەرماندەری، قومانداری ◌ فرماندهی

**command car** *noun*
جۆرێ ماشێنی سەرئاواڵە ب.ت. بۆ دیدەوانی لەشکری military reconnaissance، دەتوانێ لە جێگای نارێکدا بڕوا ◌ کوماند کار

**command economy** *noun*, also planned economy
ئابووری حکومی، ئابووری ڕێبەری‌کراو: سیستمێکی ئابووری کە لەودا چالاکی‌یەکان لە لایەن حکومەتی ناوەندی‌یەوە مەهار دەکرێ ◌ اقتصاد هدایت‌شده

**commander** /kə'ma:ndə(r), US -'mæn-/ *noun*
1 کۆماندار، فەرماندار، فەرماندەر، سەرکردە 2 ئەفسەرێ کەمێ پایەبەرز لە هێزی دەریایی ئەمریکا و بریتانیا ◌ 1 فرمانده 2 ناخدا سوم

**commander-in-chief** *noun, pl.* commanders-in-chief
فەرمانداری گشتی، سپاسالار، سەرفەرماندار ◌ فرماندەی کل قوا

**Commander of the Faithful** *noun*
یەکێ لە سەرناوەکانی خەلیفەکان، میری باوەڕداران یان بڕوامەندان ◌ امیرالمؤمنین

**commandership** /kə'ma:ndəʃɪp/ *noun*
فەرمانداری، سەرکردایەتی، فەرماندەری، قومانداری ◌ فرماندهی

**commandery** *noun, pl.* commanderies
1 پایە یا شوێنی سەرکردایەتی یان فەرماندەری، پۆست یان پلە و پایەی فەرماندەر 2 ناوچەی ژێر دەسەڵاتی فەرماندەر 3 لق یان lodge خۆجێیی local هێندێ تیرە برایەتی یان نەهێنی ◌ 1 مقام یا محل فرماندهی 2 و 3 کوماندری

**commanding** /kə'ma:ndɪŋ, US -'mæn-/ *adjective*
1 فەرماندار، فەرماندەر، سەرکردە: *Who is your commanding officer?* 2 زاڵ، سوار، هێزبەسەرداشکاو، هێزبێ‌شکاو، فەرماندەرانە، دەستووردەرانە: *a commanding figure/presence/voice* 3 دەسەڵاتدار، سەردەست (commandingly /kə'ma:ndɪŋli, US -'mæn-/ *adv*) ◌ 1 فرمانده 2 مسلط، آمرانه 3 مقتدر

**commanding officer** *noun*
ئەفسەری فەرماندار ◌ افسر فرمانده

**commandment** /kə'mɑ:ndmənt, US -'mæn-/ *noun*
دەستوور، فەرمان، دەستوور یان فەرمانی خودا(یی) ۞ فرمان، فرمان خدا

**Commandment** /kə'mɑ:ndmənt, US -'mæn-/ *noun*
فەرمانە، فەرمان، فەرمایشت (یەکێ لەو دە دەستوور و فەرمانەی کە خوا بە مووسای پێغەمبەری دا) ۞ کوماندمنت

**command module** *noun*
کابین یان ژووری کۆنترۆڵ، ژووری فەرمانداری (کەشتی ئاسمانی) ۞ مدول فرمان

**commando** /kə'mɑ:ndəʊ, US kə'mændoʊ/ *noun, pl.* commandos
1 کۆماندۆ، سەربازی تایبەت 2 کەرتی یەکینەی سەربازانی تایبەتی (بنەڕەت: لە *commandar* "فەرمان دان") ۞ 1 تکاور 2 یکان تکاور

**command performance** *noun*
پێرفۆرمانسی تایبەتی (شانۆ، فیلم و هتد) ۞ اجرای خصوصی

**command post** *noun*
بنکە یان بارەگای سەرکردایەتی، ناوەندی فەرمانداری ۞ مرکز فرماندهی

**comme ci, comme ça** /kɒm ˌsi: kɒm 'sɑ:, French kɔm si kɔm sa/ *adverb*
نە زۆر باش نە زۆر خراپ، دەستە ۞ نە خیلی خوب نە خیلی بد

**commedia dell'arte** /kɒ'meɪdɪə dɛl'ɑ:teɪ, Italian kom'mɛdja del'larte/ *noun*
کۆمێدی هونەر ۞ کمدی هنر

**comme il faut** /ˌkɒm i:l 'fəʊ, French kɔm il fo/ *adjective*
باوە، بە شێوەیێکی شیاو ۞ مطابق عرف

**commemoration** /kəˌmemə'reɪʃn/ *noun*
1 یادکردنەوە، بیرئانین: *a commemoration service* 2 ئاهەنگی یادکردنەوە ۞ 1 بزرگداشت 2 مراسم بزرگداشت، یادبود

**commemorative** /kə'memərətɪv, US -əreɪt-/ *adjective.* also commemoratory
یادگاری: *A commemorative stamp* ◊ *a commemorative plaque on the bridge records the name of the engineer* (commemoratively /kə'memərətɪvli, US -əreɪt-/ *adv*) ۞ یادبود

**commemorator** /kə'memərertə()r/ *noun*
رێکخەر یان ئاهەنگگێری یادکردنەوە، سازدەری(ئاهەنگی) یادکردنەوە ۞ برگزارکنندەی یادبود

**commencement** /kə'mensmənt/ *noun*
1 دەستپێک، سەرەتا، بەرایی 2 ئاهەنگی دەرچوون، ڕێورەسمی لە خوێندنبوونەوە ۞ 1 شروع، آغاز 2 جشن فارغ‌التحصیلی

**commendable** /kə'mendəbl/ *adjective*
لەپەسنهاتوو، شیاو یان شایانی پیاهەڵدان یان پەسندکردن، جێی ستایشت، جێی پەسن (commendably /-əbli/ *adv*:
لەپەسنهاتووانە، بەو جۆرەی کە شایانی پیاهەڵوتنە) ۞ قابل تحسین، ستودنی

**commendation** /ˌkɒmen'deɪʃn, US ˌkɑ:m-/ *noun*
1 پەسن(دان)، پیاهەڵدان، پیاهەڵوتن، ستایشت، پەسندکردن، تاریفدان: *The film deserves the highest commendation* 2 پاداشت، خەڵات 3 (پێ) سپاردن، راسپاردن (commendatory *adj*: *commendatory remarks*) ۞ 1 تحسین، ستایش 2 جایزه 3 سپارش

**commensal** /kə'mensl/ *adjective, noun*
*adj* هاوخۆر، پێکەوەخۆر، هاوخوان، هاوسفرە: *n* زیندەوەری *commensal organisms* هاوخوان (وەکوو زۆر لە بەکتریاکان؛ commensally /kə'mensli/ *adv*) ۞ *adj* هم‌سفره *n* موجود هم‌سفره

**commensalism** /kə'menslɪzəm/ *noun,* also commensality
هاوخۆری، پێکەوەخۆری، هاوخوانی، هاوسفرەیی ۞ هم‌سفرگی

**commensurability** /kəˌmensərə'bɪləti, US -sjə-/ *noun*
1 هاوڕێژەیی، هاوپێوانەیی، هاوپێوەری، هاوئەندازەیی 2 لەپێوانهاتوویی ۞ 1 تناسب 2 سنجش‌پذیری

**commensurable** /kə'mensərəb(ə)l, US -sjə-/ *adjective*
هاوپێوانە، خاوەنی پێوەرێکی هاوبەش، هاوڕێژە، هاوئەندازە، لەپێوانهاتوو (commensurably *adv*) ۞ متناسب، سنجش‌پذیر

**commensurate** /kə'menʃərət/ *adjective*
هاوڕێژە، هاوئەندازە، بەرامبەر، بەقەدیەک، تەراز، هاوتەراز، یەکسان، یەکڕادە، هاوپێوانە، خاوەنی پێوەرێکی هاوبەش، coextensive، proportionate: *was given a job commensurate with her abilities* ◊ *Salary will be commensurate with experience* (commensurately /kə'menʃərətli/ *adv*: هاوڕێژانە، بە شێوەیەکی هاوڕێژە؛ -surateness /kə'menʃərətnəs/ *n*: هاوڕێژەیی، هاوئەندازەیی، هاوڕادەیی، پێکەوتن، پێکخواردن) ۞ متناسب، مساوی، دارای مقیاس مشترک

**comment** /'kɒment, US 'kɑ:m-/ *noun*
1 بۆچوون، لێدوان، وتە، گوتە، قسە، را 2 تێبینی،

رادەربڕین، رابێژی 3 شرۆڤەکردن، شیکردنەوە، لێکدانەوە 4 رەخنە(گری) 5 مشتومڕ ◌ 1 نظر، حرف 2 اظهار نظر 3 تفسیر 4 انتقاد 5 جر و بحث

**commentarial** *adjective*
رەخنەگرانە ◌ انتقادی

**commentary** /ˈkɒməntri, US ˈkɑːmənteri/ *noun, pl.* commentaries
1 لێکدانەوە، لێدوان (لەسەردان)، روونکردنەوە، راوە، تاوتوێ (کردن)، شیکردنەوە، شرۆڤە: *a critical commentary on the final speech of the play* 2 راپۆر: *a sports commentary* 3 بۆچوونونووسی، تێبینینووسی 4 رەخنەگری ◌ 1 شرح، تفسیر 2 گزارش 3 تقریظ 4 انتقاد

**commentation** /kɒmənˈteɪʃn/ *noun*
1 رادەربڕین، رابێژی 2 بۆچوونونووسی ◌ 1 اظهار نظر 2 تقریظ

**commentator** /ˈkɒmənteɪtə(r), US ˈkɑːm-/ *noun*
1 لێکدەرەوە، روونکەرەوە، راوەکار، شیکەرەوە: *a political commentator* 2 راپۆرێژ ◌ 1 مفسر، شارح 2 گزارشگر

**commerce** /ˈkɒmɜːs, US ˈkɑːmɜːrs/ *noun*
1 کارداری، بازرگانی، بازاڕداری 2 بیرگۆڕکێ، گۆڕینەوەی بیروڕا 3 هەڵسوکەوت، هەڵسانودانیشتن 4 پێوەندی 5 پێوەندی سێکسی، جووتبوون، هاوجێیی، نزیکی، بەسەرپەڕین، sexual intercourse ◌ 1 تجارت، بازرگانی 2 تبادل اندیشه 3 معاشرت 4 رابطه 5 رابطەی جنسی نامشروع، جماع

**commercial** /kəˈmɜːʃl, US kəˈmɜːrʃl/ *adjective, noun*
1 *adj* کارداری، بازرگانی، بازاڕداری: *the commercial heart of the city* 2 بازاڕی، بەخێر، پڕقازانج، پڕداهات: *commercial baby foods* 3 تایبەتی (رادیۆ و تەلەفزیۆن) 4 (سووکانە) بازاڕی، ئایەخ، رەشۆکی *n* ئاگاداری بازرگانی، ریکلام، بانگەواز یان راگەیاندنی کارداری (commerciality *n*؛ commercially /-ʃəli/ *adv*: لە باری کارداری یان ماڵییەوە یان بازرگانییەوە: *commercially grown/developed* ◊ *commercially produced*) ◌ 1 *adj* بازرگانی 2 پولساز 3 خصوصی 4 بازاری *n* آگهی بازرگانی

**commercial agent** *noun*
نوێنەر یان بریکاری کاداری یان بازرگانی ◌ نمایندەی بازرگانی

**commercial art** *noun*
هونەر یان گرافیکی ریکلام ◌ طراحی تبلیغاتی

**commercial artist** *noun*
گرافیستی ریکلام ◌ طراح تبلیغاتی

**commercial bank** *noun*
بانکی کارداری یان بازرگانی ◌ بانک بازرگانی

**commercial break** *noun*
پسان یان دابڕانی بڵاوکردنەوەی ئاگاداری ◌ وقفەی پخش آگهی

**commercial company** *noun*
بەشدارەکی، کۆمپانی کارداری یان بازرگانی ◌ شرکت بازرگانی

**commercial-free** *adjective*
(بەرنامەی رادیۆ و تەلەفزیۆن) بێئاگاداری ◌ فاقد آگهی

**commercialism** /kəˈmɜːʃəlɪzəm, US -ˈmɜːrʃl-/ *noun*
بەرژەوەندخوازی، قازانجگەری، پارەگەری، بازاڕگەری، بازاڕخوازی، گیانی کارداری ◌ سودگرایی

**commercialization** /kəˌmɜːʃəlaɪˈzeɪʃn, US -ˌmɜːrʃləˈz-/ *noun*
بازاڕیکردن، بازرگانیکردن، کارداریکردن ◌ تجاری کردن، پولساز کردن

**commercialized** *adjective*
کارداریانە، بازرگانییانە، بازاڕییانە، پڕقازانج، خێردەرەوە ◌ پولساز، تجاری

**commercial loan** *noun*
قەرزی کارداری یان بازرگانی ◌ وام بازرگانی

**commercial radio** *noun*
رادیۆی تایبەتی (ناحکومی) ◌ رادیوی خصوصی

**commercial set** *noun*
کۆمەڵەی کارداری یان بازرگانی ◌ مجموعەی بازرگانی

**commercial television** *noun*
تەلەفزیۆنی تایبەتی ◌ تلویزیون خصوصی

**commercial traveller** = sales representative

**commercial treaty** *noun*
پەیماننامەی کارداری یان بازرگانی ◌ معاهدەی تجاری

**commercial vehicle** *noun*
ماشێنی راگوێستن (کەلوپەل)، ماشێنی ماڵ و کۆچ ◌ وسیلەی نقلیەی باری

**commère** /ˈkɒmɛː/ *noun*
(بریتانیا، ژن) پێشکەشکار، بەڕێوەبەر (شانۆ، تەلەفزیۆن) ◌ (زن) مجری

**commie** /ˈkɒmi, US ˈkɑːmi/ = communist

**commination** /ˌkɒmɪˈneɪʃ(ə)n/ *noun*
هەڕەشە، هەڕەشە و گوڕەشە، گەف، ترسخستنەبەر، denunciation ◌ تهدید

**comminatory** /ˈkɒmɪnəˌt(ə)ri/ *adjective*
هەڕەشەییانە، هەڕەشاوی ◌ تهدیدآمیز

**comminuted** /ˈkɒmɪnjuːtɪd/ *adjective*
وردوخاش، هاڕاو، هەڵپڕواو ◌ خرد

**comminution** /ˌkɑːməˈnjuːʃən/ *noun*
وردوخاشبوون، هاڕین، کردنەخوڵ،

وردوخاش‌کردن، قەپرتکان، هەڵپریواندن ◌ خردشدگی، خردکردن

**commiseration** /kəˌmɪzəˈreɪʃn/ *noun*

1 دەربڕینی هاوسۆزی: *I offered him my commiseration* 2 خەمخۆری، هاوبەرۆشی، دڵسۆزی 3 بەزەیی‌پیاهاتن، دڵ‌پێ‌سووتان ◌ 1 ابراز همدردی 2 همدردی 3 ترحم

**commiserative** /kəˈmɪzərətɪv/ *adjective*

هاوسۆزانە، خەمخۆرانە، دڵسۆزانە ◌ همدردانە

**commissaire** /ˌkɒmɪˈsɛː, French kɔmisɛʀ/ *noun*

گەورەئەفسەری پۆلیسی فەرەنسە ◌ افسر ارشد پلیس فرانسە

**commissarial** /-ˈsɛːrɪəl/ *adjective*

سەربە کۆمیساریا ◌ وابستە بە کمیسریە

**commissar** /ˌkɒmɪˈsɑː(r), US ˌkɑːm-/ *noun*

(جاران) کۆمیسار، سەرۆکی بەڕێوەبەری حکومی لە یەکێتی سۆڤیەت تا 1946، (جاران) ئەفسەری لە ئەرتەش یان سپای یەکێتی سۆڤیەت (بنەڕەت: لە *komissar* رووسی، لە *commissaire* فەرەنسی) ◌ کومیسار

**commissariat** /ˌkɒmɪˈseəriət, US ˌkɑːmɪˈser-/ *noun*

1 کۆمیساریا (بەڕێوەبەرایەتی حکومی لە یەکێتی سۆڤیەت تا 1946) 2 بەڕێوەبەرایەتی خۆراک یان خواردەمەنی، بەڕێوەبەرایەتی میرە (لە ئەرتەش‌دا) ◌ 1 کومیسریە 2 سررشتەداری

**commissary** /ˈkɒmɪsəri, US ˈkɑːmɪseri/ *noun, pl.* commissaries

فرۆشگا، خواردنگە (چکۆلە؛ بنکەی سەربازی، زیندان و ستۆدیۆی سینەما) ◌ فروشگاه

**commission** /kəˈmɪʃn/ *noun*

1 پێ‌سپاردن 2 ئەرک، کار، پەیوەر، بەڵێنی، دەربەندی 3 کار پێ‌سپاردن، راسپاردەیی، راسپێری، فەرمانبەری 4 بریکاری، نوێنەرایەتی 5 بەرپرسایەتی، دەسەڵات 6 لیژنە، لیژنە 7 دەڵاڵی، دەڵاڵانە، کارانە، دەسبایی، دەس‌بوها، کۆمیسیۆن 8 (گوناه)کردن، دەس‌تیابوون 9 بڕیار، دەستوور، فەرمان 10 پۆست یا پلەوپایەی سەربازی ◌ 1 سفارش 2 وظیفە، تعهد 3 مأموریت 4 نمایندگی 5 تصدی، اختیار 6 هیأت 7 کارمزد، حق‌العمل 8 ارتکاب 9 حکم 10 مقام نظامی

**commissionaire** /kəˌmɪʃəˈneə(r), US -ˈner/ *noun*

(زۆرتر لە بریتانیا) دەرکەوان، درگاوان، داڵان‌دار، پەردەدار ◌ دربان، حاجب

**commissioned officer** *noun*

ئەفسەری هەمیشەیی یان کادر ◌ افسر کادر

**commissioner** /kəˈmɪʃənə(r)/ *noun*

1 ئەندامی لیژنە 2 نوێنەر 3 کاربەدەست (گشتی) یان فەرمانبەری پایەبەرز ◌ 1 عضو کمیسیون 2 نمایندە 3 افسر یا مأمور عالی‌رتبە

**commitment** /kəˈmɪtmənt/ *noun*

1 بەڵێنی، خۆبەستەیی، دەربەستی، گفت، سۆز، پەیمان 2 بەرپرسایەتی، خستنەئەستۆ، لەمل‌گرتن 3 گوناهکردن، تووش‌بوون (گوناه)، دەس‌تیابوون 4 سپاردن، پێ‌سپاردن، دانەدەست، بەدەستەوەدان 5 تایبەتی‌دان، تەرخان‌دان، تەرخان‌کردن 6 بڕیاری دەس‌بەسەری یا گرتن 7 کار 8 وەفاداری، بەئەمەگی، باوەڕ ◌ 1 تعهد، قول، عهد 2 مسئولیت 3 ارتکاب 4 سپارش، تسلیم 5 اختصاص 6 حکم توقیف 7 مشغلە 8 وفاداری

**committable** /kəˈmɪtəbl/ *adjective*

پێی دەکرێ گوناه بکا ◌ قابل ارتکاب

**committal** /kəˈmɪtl/ *noun*, also commitment

1 ناردن، شاندن، دانەدەس، سپاردن (ب.ت. بۆ زیندان یان شێتخانە) 2 بەڵێنی، پێبەندی، خۆبەستەیی ◌ 1 تحویل، فرستادن 2 تعهد

**committed** /kəˈmɪtɪd/ *adjective*

خۆبەستە، پێبەند، دەربەست، بەئەستۆگرتوو: *a committed member of the team* ◌ متعهد

**committee** /kəˈmɪti/ *noun*

لیژنە، لیژنە، کۆمیتە: *a committee member* ◌ کمیتە، کارگروه، کمیسیون

**committeeman** *noun, pl.* committeemen

ئەندامی لیژنە ◌ عضو هیأت بررسی

**committeewoman** *noun, pl.* -itteewomen

ئەندامی لیژنە (ژن) ◌ عضو هیأت بررسی

**commixture** *noun*

تێکەڵە، ئاوێتە، تێکەڵ‌کردن ◌ آمیزه، امتزاج

**commode** /kəˈməʊd, US kəˈmoʊd/ *noun*

1 دراوێر، دۆڵابی کەشەوی 2 کورسی کاسەدار یان لەگەن‌داری نەخۆش، کورسی کون(دار)ی نەخۆش ◌ 1 دراور 2 توالت فرنگی بیمار

**commodious** /kəˈməʊdiəs, US -ˈmoʊ-/ *adjective*

1 (فەرمی) ئاسوودە، فراوان، هەراو، گەورە، جێ‌دار، *a commodious closet* :roomy 2 (کۆن) serviceable ,handy = جادار ◌

**commodiously** /kəˈməʊdiəsli, US -ˈmoʊ-/ *adverb*

بە شێوەیەکی هەراو یان گەورە ◌ بە طور جادار

**commodiousness** /kəˈməʊdiəsnəs, US -ˈmoʊ-/ *noun*

ئاسوودەیی، فراوانی، هەراوی، گەورەیی، جێ‌داری ◌ جاداری

**commodity** /kəˈmɒdəti, US -ˈmɑːd-/ *noun, pl.* commodities

1 کەل‌وپەل، کاڵا، کوتاڵ، بابەت، شمەک، ماڵ، جنس، بەرهەم، بەروبۆ، شت‌ومەک، شت 2

(commodities) کـەلوپـەل، شـتومـەک، ویستەمەنی ◊ 1 کالا، متاع، جنس، محصول، شیء 2 (در جمع) وسایل، لوازم

**commodore** /'kɒmədɔ:(r), US 'kɑ:m-/ *noun*

1 ئەفسەریکی پایەبەرز لە هێزی دەریاییدا (تێوان captain و rear-admiral) 2 سەرۆک یان بەڕێوەبەری یانەی بەلەمەوانی 3 فەرمانداری کەشتیگەلی کارداری ◊ 1 ناخدایکم ارشد 2 رئیس یا مدیر باشگاه قایقرانی 3 فرمانده ناوگان بازرگانی

**common** /'kɒmən, US 'kɑ:mən/ *adjective* (commoner, commonest), *noun*

*adj* 1 هاوبەش، هەڤپار، هەڤپشک، خەڵکی ڕەمەکی، گشتی، گەلەمپەری، هەموو، گشت، تێکڕا، پێکەوەیی: *work for the -mon good* ◊ 2 ئاسایی، *common ownership of the land* بێپلەوپایە، عەدەتی 3 باو، بەبرەو، داب 4 زۆر، فرە، گەڵێ 5 سادە، ناتایبەتی 6 ڕەمەکی، بازاڕی 7 سووک، هیچەکە 8 بێڕەوشت *n* چیمەن، مێرگ ◊ *adj* 1 مشترک، عامە، همگانی، همە، اشتراکی 2 عادی، معمولی 3 رایج، مرسوم، متداول 4 زیاد 5 سادە 6 عامی 7 پست 8 بی‌ادب *n* چمن

**commonable** /'kɒmənəbl/ *adjective*

هاوبەش، هەموو دەتوانن بەکاریبێنن ◊ مشترک

**commonage** /'kɑ:mənɪdʒ/ *noun*

1 چینی خەڵکی ڕەمەکی، جەماوەر 2 مافی لەوەڕاندنی (لە زەوی) گشتی 3 زەوییێ بۆ لەوەڕاندنی گشتی، جێیلەوەڕی گشتی ◊ 1 طبقەی عامە 2 و 3 کوموناژ

**commonality** /'kɑ:mənæltɪ/ *noun, pl.* commonalities

هاوبەشی، لایەنی هاوبەشی ◊ اشتراک

**commonalty** /'kɒmən(ə)ltɪ/ *noun*

خەڵک، جەماوەر، خەڵکی ئاسایی یان ڕەمەکی ◊ تودە

**common belief** *noun*

باوەڕی گشتی ◊ عقیدەی عمومی

**common carrier** *noun*

1 کۆمپانی ڕاگوێستن یان گوێزانەوەی گشتی، ناوکۆیی گواستنەوەی گشتی 2 (ئەمریکا) کۆمپانی دابینکەری ئاسانکاری پێوەندییە گشتییەکان ◊ 1 شرکت حمل‌ونقل عمومی 2 شرکت تأمین‌کنندەی تسهیلات روابط عمومی

**common centre** *noun*

ناوەندی هاوبەش ◊ مرکز مشترک

**the common cold** = cold

**common courtesy** *noun*

ڕەوشتبەرزی، ڕەوشت، تۆرە ◊ ادب

**common decency** *noun*

ڕەوشتی چاوەڕوانکراو، هەڵسوکەوت یان ڕەفتاری ئاسایی (لە کەسێکی بەرپرس) ◊ رفتار عادی

**common denominator** *noun*

1 (بیرکاری) ژێرەی هاوبەش 2 لایەنی هاوبەش (لە لایەن هەموو ئەندامانی کۆمەڵێکەوە) ◊ 1 مخرج مشترک 2 وجه تشابه

**common dialect** *noun*

زاراوەی هاوبەش، هاودەڤۆک ◊ گویش مشترک

**commoner** /'kɒmənə(r), US 'kɑ:m-/ *noun*

کەسێکی ڕەمەکی یان ئاسایی، مرۆی ئاسایی ◊ آدم معمولی

**Common Era** = Christian Era

**common factor** *noun*

هۆکاری هاوبەش ◊ عامل مشترک

**common fraction** *noun*

(بیرکاری) کەرتی ئاسایی یان کۆمۆن ◊ کسر متعارفی

**common gender** *noun*

زایەندی هاوبەش، ڕەگەزی هاوبەش ◊ جنس مشترک

**common ground** *noun*

لایەنی هاوبەش یان لێکچوو ◊ وجه تشابه

**common knowledge** *noun*

شتێ کە هەموو خەڵک لێی ئاگادارە ◊ چیزی کە مورد اطلاع عموم است

**common land** *noun*

زەوی گشتی، زەوییەشەریکە، زەوی ناوکۆ ◊ زمین مشاع

**common language** *noun*

زمانی هاوبەش، هاوزمان ◊ زبان مشترک

**common law** *noun*

زاگۆن یان قانوونی ئاسایی یان نەنووسراو ◊ قانون عرفی

**common-law** *adjective*

عورفی، نەریتی، لەسەر بنەمای زاگۆن یان قانوونی ئاسایی ◊ عرفی

**common-law husband** *noun*

هاوسەر یان مێردی ئاسایی، مێردی عورفی یان نەریتی (بێئەوەی کە ئاهەنگی بۆ گێرابێ) ◊ همسر یا شوهر عرفی

**common-law marriage** *noun*

هاوسەرگری ئاسایی یان نەریتی، ژنومێردایەتی ئازاد یان ناشەرعی ◊ ازدواج عرفی

**common-law wife** *noun*

ژنی ئاسایی، ژنی عورفی یا نەریتی، ژنی ئازاد یا ناشەرعی ◊ زن عرفی

**commonly** /'kɒmənli, US 'kɑ:m-/ *adverb*

زۆرتر، بە شێوەیەکی ئاسایی، بە ئاسایی: *commonly held opinions* ◊ معمولاً

**common man** *noun*

کەسێکی ئاسایی، مرۆ یان بنیادەمی ئاسایی،

(کۆن) ئاسایشی گشتی، ئاسایشتی گشتی ◌ رفاه عمومی

**commonwealth** /'kɒmənwelθ, US 'kɑːm-/ *noun*

کۆمەڵگا، گەل، وڵات ◌ اجتماع، کشور

**Commonwealth** /'kɒmənwelθ, US 'kɑːm-/ *noun*

1 (لە ئەمریکا) ولاتە هاوبەرژەوەندەکان، ولاتانی هاوبەرژەوەند 2 ئەیالەت ◌ 1 کشورهای مشترک‌المنافع 2 ایالت

**Commonwealth Day** *noun*

پشووێ لە چەند بەشێکی کامین‌وێلسی نەتەوەکان، جاران لە 24ی مایس وەک ساڵوەگەڕی (لەدایکبوونی فیکتۆریای شاژن و ئێستا دووهەمین دووشەممەی مانگی مارچە ◌ روز کامن‌ولت

**Commonwealth of Independent States** *noun, pl.*

کۆمەڵەی ولاتانی سەربەخۆی هاوبەرژەوەند ◌ جامعەی کشورهای مستقل مشترک‌المنافع

**common year** *noun*

ساڵی ئاسایی (کە 365 رۆژی هەیە) ◌ سال عادی

**commotion** /kə'məʊʃn, US -'moʊ-/ *noun*

1 قەرقەشە، زاوە، هەراوهوریا، گوێبەند، هۆسە، جەنجاڵی، هەنگامە، چەقەولوورە، گالەگورت 2 پشێوی، ئالۆزی، ئاژاوە، بێ‌سەروسامانی، شێواوی ◌ 1 هیاهو، سروصدا 2 اغتشاش، آشوب

**communal** /kə'mjuːnl, 'kɒmjənl, US 'kɑːm-/ *adjective*

1 هاوبەش، شەریکی، شەریکە، شەریکانە، هاوبەشانە، بۆهەموو، گشتی، کۆمۆنیستی: *a communal kitchen/garden, etc* 2 کۆمەڵی، خۆجێیی، کەمینەیی، فیرقەیی ◌ 1 مشترک، اشتراکی 2 گروهی، محلی، فرقه‌ای

**communalism** /kə'mjuːnəlɪzəm, 'kɒmjənəl-, US 'kɑːm-/ *noun*

کامیۆنالیزم ◌ کامیونالیسم

**communally** /kə'mjuːnli, 'kɒmjənli, US 'kɑːm-/ *adverb*

پێکەوە، بە شەریکی، هاوبەشانە ◌ مشترکاً

**communard** /'kɒmjʊnɑːd/ *noun*

1 ئەندامی کۆمۆن 2 (مێژوویی) لایەنگری کۆمۆنی پاریس ◌ 1 عضو کمون 2 طرفداری کمون پاریس

**commune** /'kɒmjuːn, US 'kɑːm-/ *noun*

1 کۆمۆن (= چکۆلەترین یەکە یان کەرتی حکومەتی خۆجێیی لەگەڵ شارەوان و ئەنجومەن، لە فەرەنسە، بێلژیک، ئیتالیا و سپانیا) 2 کۆمەڵی هاوبەش (لە پۆست و بەرپرسایەتی‌دا هاوبەشن) 3 کیبوتس، کاڵخۆز ◌ 1 کمون 2 جمعیت اشتراکی 3 کیبوتس، کالخوز

پیاوی ئاسایی ◌ آدم عادی

**the Common Market** *noun*

بازاڕی هاوبەش ◌ بازار مشترک

**common metre** *noun*

چوارخشتەکی ◌ دوبیتی

**common noun** *noun*

(ڕێزمان) ناوی گشتی، ئاماژە بە شتێک دەکا کە ناوی کەس، شت یان شوێنێکی تایبەتی نییە (sea, cat, table؛ بڕوانە abstract noun (proper noun ◌ اسم عام

**common nuisance** *noun*

بەلای گشتی، زەرەری گشتی ◌ آفت عمومی

**common-or-garden** *adjective*

ئاسایی، ناتایبەتی، عەدەتی ◌ عادی

**common ownership** *noun*

خاوەنداری گشتی ◌ مالکیت عمومی

**common people** *noun*

خەڵکی ڕەمەکی، جەماوەر، خەڵک ◌ مردم عادی

**commonplace** /'kɒmənpleɪs, US 'kɑːm-/ *adjective, noun*

1 *adj* ئاسایی، عەدەتی: *a commonplace occurrence* 2 هیچەکە، تایەخ، ناگرنگ، پڕوپووچ، وەڕەسکەر، وەڕەزکەر، شەکەت‌کەر *n* شتێکی ئاسایی ◌ 1 *adj* معمولی، عادی 2 مبتذل، پیش‌پاافتاده، کسل‌کننده *n* امر عادی

**common principle** *noun*

بنەما یان بنچینەی هاوبەش ◌ اصل مشترک

**common porperty** *noun*

زەوی‌یەشەریکە، زەوی‌وزاری گشتی، زەمینی گشتی ◌ زمین عمومی

**common room** *noun*

ژووری حەسانەوە ◌ اتاق استراحت

**common run** *noun*

ڕەوتی ئاسایی، نەریتی باو ◌ روال عادی

**Commons** /'kɒmənz, US 'kɑːm-/ *noun, pl.*

1 = the House of Commons 2 خەڵکی ئاسایی، جەماوەر، خەڵکی ڕەمەکی ◌ تودە، مردم عادی

**common salt** *noun*

خوێی چێشت ◌ نمک طعام

**common sense** *noun*

هەستی هاوبەش، دادگەری یان لێکدانەوەی دروست، عەقڵی سەلیم: *a common-sense approach to a problem* ◌ عقل سلیم

**common stocks** *noun*

(ئابووری) بەشە یا ستاکە هاوبەشەکان، بەشە ئاسایی‌یەکان ◌ سهام عادی

**common time** *noun*

(موسیقا) دوو یان چوار ترپە لە خانەیەکدا ◌ میزان چهار ضربی

**commonweal** /'kɒmənwiːl/ *noun*

**communicable** /kə'mju:nɪkəbl/ *adjective*
1 رابگوێز، لەراگوێستن‌هاتوو، رادەگوێزری، شیاوی راگەیاندن، رادەگەیێنری 2 تەشەنەکردوو، درم، بگرەوە، پەتا، ○ *communicable diseases* :transmittable
1 انتقال‌پذیر، ابلاغ‌پذیر 2 مسری

**communicant** /kə'mju:nɪkənt/ *noun*
1 راگەیێنەر، پێوەندی‌گر 2 راگوێزەر 3 سیخوڕ، شۆفار 4 بەشدار لە ئاهەنگی شێوی خواوەندی‌دا ○ 1 مبلغ 2 انتقال‌دهنده 3 جاسوس 4 شرکت‌کننده در مراسم عشاء ربانی

**communication** /kə,mju:nɪ'keɪʃn/ *noun, adjective*
*n* 1 راگەیاندن، دانەزانین 2 پێوەندی، تێکەڵی: *We are in regular communication by email* 3 گەیاندن 4 زانیاری، هەواڵ، پەیام، وەلام، پێغام، میساژ: *a communication from the leader of the party* 5 گرتنەوە، راگوێستن، تەشەنە (کردن) *adj* پێوەندیدار، راگەیێنەرانە ○ *n* 1 ابلاغ 2 ارتباط 3 رسانش 4 اطلاعات، خبر، سرایت، انتقال *adj* ارتباطی

**communication cord** *noun*
(لە ترێن‌دا) پەتکی مەترسی، تەناف یان پەتکی تەنگەتاوی، پەتکی زەنگ، دەسک یان دەسەگیرە مەترسی ○ طناب خطر

**communications** *noun, pl.*
1 دەزگاکانی راگەیاندنی گشتی، راگەیێنە گشتی‌یەکان، هۆکانی راگەیاندنی گشتی 2 هۆکانی پێوەندی گشتی 3 تۆڕی تەلەفونی ○ 1 ارتباطات، رسانەها 2 وسایل ارتباطی 3 مخابرات

**communications satellite** *noun*
ساتەلایتی زانیاری‌نێر، ساتەلایتی گەیێنەر ○ ماهوارەی مخابراتی

**communicative** /kə'mju:nɪkətɪv, US -keɪtɪv/ *adjective*
1 ڕووخۆش، قسەخۆش، زۆربڵە، 2 talkative سەربە communication: *communicative skills* ○ خوش‌مشرب، پرحرف

**communicativeness** /kə'mju:nɪkətɪvnəs, US -keɪtɪvnəs/ *noun*
ڕووخۆشی، قسەخۆشی، زۆربڵەیی ○ خوش‌مشربی، پرحرفی

**communicator** /kə'mju:nɪkeɪtə(r)/ *noun*
راگەیێنەر ○ ابلاغ‌کنندە

**communion** /kə'mju:niən/ *noun*
1 پێوەندی 2 دەستایین، تیرەی دینی یان ئایینی ○ 1 ارتباط 2 فرقه

**Communion** /kə'mju:niən/ *noun*
شێوی خواوەندی یان خوایی ○ عشاء ربانی

**communiqué** /kə'mju:nɪkeɪ, US kə,mju:nə'keɪ/ *noun*
لێدوان، راگەیاندن‌نامە، ئاگاداری (ب.ت. بۆ چاپەمەنی‌یەکان) ○ اطلاعیه

**communism** /'kɒmjunɪzəm, US 'kɑ:m-/ *noun*
1 کۆمۆنیزم: سیستم یان دەزگا و ڕێکخستەیەکی ئابووری و کۆمەلایەتی کە لەودا هیچ خاوەنداری‌یەکی تایبەتی نابینری و هۆکانی بەرهەم‌هێنان هەموو سەربە ئەندامانی کۆمەڵگان 2 ڕیباز یان بزووتنەوەیەکی سیاسی کە مەبەستی دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی ئاوایە 3 سیستم یان ڕێکخستەیەکی حکومی کە لە لایەن پارتی کۆمۆنیستەوە (هەروەک لە یەکێتی سۆڤیەت‌دا) بەڕێوەدەبرێ ○ کمونیسم

**communist** /'kɒmjənɪst, US 'kɑ:m-/ *noun, adjective*
*n* کۆمۆنیست، لایەنگری کۆمۆنیزم، ئەندامی بزووتنەوە یان پارتی کۆمۆنیستی *adj* سەربە کۆمۆنیزم، کۆمۆنیستی ○ *n* کمونیست *adj* وابسته به کمونیسم، کمونیستی

**communist ideology** *noun*
بیروباوەڕ یان ئایدیۆلۆژی کۆمۆنیستی ○ ایدئولوژی کمونیستی

**Communist Manifesto** *noun*
مانیفێستۆی کۆمۆنیست ○ مانیفستوی کمونیست

**the Communist Party** *noun*
پارتی کۆمۆنیزم ○ حزب کمونیست

**communitarianism** /kə,mju:nɪ'tɛ:rɪənɪz(ə)m/ *noun*
شێوەیێکی ڕێکخستنی کۆمەلایەتی لەسەر بنچینەی کۆمەڵە خۆبەڕێوەبەرەکان ○ کومیونیتارینیسم

**community** /kə'mju:nəti/ *noun (pl. communities), adjective*
*n* 1 کۆمەڵگا، جڤاک، کۆمەڵ 2 دەستە، پوورە، کۆمەڵ، گروپ، تاقم 3 خەڵک، گەل، ئۆمەت 4 کەمینە 5 هاوبەشی، شەریکی، هاوخاوەنایەتی، خاوەنداری هاوبەش 6 یەکێتی، هەڤگرتوویی 7 لێکچوون، هاوشێوەیی، نزیکایەتی 8 هەستان و دانیشتن، هەڵس‌وکەوت 9 (ژینگەناسی) کۆمەڵ، کۆمەڵگا، پوورە *adj* کۆمەلایەتی، جڤاکی ○ *n* 1 اجتماع، جامعه 2 جماعت، هیأت، گروه 3 مردم، امت 4 اقلیت 5 اشتراک، مالکیت اشتراکی 6 اتحاد 7 تشابه، نزدیکی 8 معاشرت 9 (بوم‌شناسی) جامعه، اجتماع *adj* اجتماعی

**community centre** *noun*, also community center
یانەی گەڕەک یان خۆجێیی ○ باشگاه محل

**community chest** *noun*
سنووقی خێر و خێرات، سنووقی یارمەتی ○ صندوق خیرات

**community college** *noun*, also community

school
(لە ئەمریکا) کۆلێژی دووساڵە ۞ کالج دو ساله
**community home** *noun*
ناوەندی راهێنان، پەروەردەخانە (لاوە تاوانکارەکان) ۞ دارالتأدیب
**community police** *noun*
پۆلیسی گەڕەک ۞ پلیس محله
**community policing** *noun*
بە گەڕەککردنی (گەڕەکاندنی) فەرمانبەرانی پۆلیس ۞ ناحیه‌ای کردن مأموران پلیس
**community service** *noun*
راژە یان خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی، کاری خۆرایی ۞ کار عام‌المنفعه
**community singing** *noun*
گۆرانی (وتنی) بەکۆڕ ۞ آواز جمعی
**community study** *noun*
لێکۆڵینەوە لەبارەی کۆمەڵگاوە ۞ اجتماع‌پژوهی
**communization** *noun*
1 کۆمۆنیستاندن، کردنەکۆمۆنیست 2 گشتیکردن، گشتاندن، هاوبەشاندن ۞ 1 کامیونیزاسیون 2 مشترک‌سازی، عمومی‌سازی
**commutability** /kəˌmjuːtəˈbɪləti/ *noun*
لەگۆڕینهاتوویی، لەداشکانهاتوویی (سزا) ۞ تبدیل‌پذیری، تخفیف‌پذیری
**commutable** /kəˈmjuːtəbl/ *adjective*
لەگۆڕینهاتوو، لەداشکانهاتوو، دەگۆڕێ، دادەشکێ ۞ تبدیل‌پذیر، تخفیف‌پذیر
**commutation** /ˌkɒmjuˈteɪʃn, US ˌkɑːm-/ *noun*
1 هاتوچۆی رۆژانە، هاتنوچوون (نێوان ماڵ و کار، ب.ت. لە شار) 2 (ماف) سزاگۆڕی، گۆڕینی سزا (بۆ سزایەکی سووکتر)، سزاگۆڕکێ، داشکاندن، سووککردن، کەمکردن: *a commutation of the death sentence to life imprisonment* 3 گۆڕین، جێگۆڕکێ، گۆڕینەوە ۞ 1 رفت‌وبرگشت 2 تخفیف 3 تبدیل، جابجایی
**commutation ticket** *noun*
تیکێتی هاتوچۆی چەندجارە ۞ بلیت رفت و برگشت مکرر
**commutative** /kəˈmjuːtətɪv/ *adjective*
1 گۆڕینەوەیی، جێگۆڕکێیانە، جێگۆڕانە (بۆ نموونە: $a \times b = b \times a$) 2 داشکێنەرانە ۞ 1 تبادلی 2 تخفیف‌آمیز
**commutative law** *noun*
قانوونی جێگۆڕکێ ۞ قانون جابجایی
**commutator** /ˈkɒmjuteɪtə(r), US ˈkɑːm-/ *noun*
1 (کارەبا) تەزووگۆڕ 2 (بیرکاری) جێگۆڕ، گۆڕەر ۞ 1 تغییردهندەی جریان (برق) 2 تعویض‌گر
**commuted** *adjective*
سزاگۆڕاو، سووک کراو، (لێ)داشکاو، کەم کراو، لێهەڵگیراو ۞ تخفیف‌یافته
**commuter** /kəˈmjuːtə(r)/ *noun*
هاتوچۆکەری رۆژانە، رێبواری هەر رۆژە (نێوان ماڵ و کار یان suburb و شار) ۞ بسیار رفت‌وآمدکننده
**commuter belt** *noun*
پشتێنەی هاتوچۆ ۞ کمربند مسکونی
**commy** *noun*
چەپی، چەپگر، کۆمۆنیست ۞ کمونیست
**Comoron** /ˈkɒmərən/ *noun*
*n* خەڵک یان رەسەنی Comoros، وڵاتێکی پێکهاتوو لە کۆمەڵە دوورگەیێکی باکووری ماداگاسکار *adj* سەربە کۆمۆرۆس ۞ *n* اهل کوموروس *adj* وابسته به کوموروس
**comp** *abbreviation informal:* 1 Brit. competition 2 Brit. comprehensive school 3 Brit. compositor 4 composition 5 compilation 6 complimentary ticket or voucher 7 Amer. compensation 8 Amer. musical accompaniment
**compact**[1] /kəmˈpækt, ˈkɒmpækt, US ˈkɑːm/ *adjective, noun*
1 *adj* پەستێنراو، کەڵەکە، پەسواو، پەستاوتە، شێلانە، پاڵپەکخراو، تێکترنجاو، تێکنراو 2 کورتە، پوختە 3 پتەو، تۆکمە، سفت، گردوکۆ *n* 1 قوتو یان جێبۆدرە 2 ماشێنی کەمجێگر یان چکۆلانە، ماشێنی گردوکۆ یان قوتو(یی هەڵکەوتوو) ۞ *adj* 1 متراکم، فشرده 2 موجز 3 سفت، جمع‌وجور *n* 1 جاپودری 2 ماشین نقلی
**compact**[2] /ˈkɒmpækt, US ˈkɑːm-/ *noun*
وتەوبڕە، گرێبەست، بەیابەست، قەراروبڕێ، رێککەوتننامە، پەیماننامە (نێوان دوو یان چەند لایەن) ۞ قرارداد، موافقت‌نامه، معاهده
**compact disk** *noun*
سیدی پەسواو، پەپکەی پەستێنراو (یان پەستێوراو) ۞ دیسک فشرده
**compacted** *adjective*
پەستێوراو، پەستێنراو، پەسراو، پەسواو، پەستاوتە، کەڵەکە، داگیراو، شێلراو، شێلانە، پاڵپەکخراو، تێکترنجاو، تێکنراو ۞ فشرده
**compactly** /kəmˈpæktli, ˈkɒmpæktli, US ˈkɑːm/ *adverb*
پەستێوراوانە، پەستاوتانە، بەشێوەیەکی تێکترنجاو ۞ به طور فشرده
**compactness** /kəmˈpæktnəs, ˈkɒmpæktnəs, US ˈkɑːm/ *noun*
گردوکۆیی، پەسراوی، پەستێوراوی، پەستاوتەیی، داگیراوی ۞ فشردگی
**compadre** /kɒmˈpɑːdreɪ/ *noun, pl.* -padres
(نافەرمی) رفیق، رەفیق، دۆست، ئاوەڵ (بنەڕەت: سپانیایی "godfather") ۞ رفیق

**companion** /kəm'pænIən/ *noun, adjective*
*n* 1 هـاوڕێ، دۆسـت، یـار، ئـاوەڵ، هەڤـاڵ، هاونشین، هاونان 2 شەریک، هاوکار 3 تا، لف 4 هەندبووک 5 (Companion) ئەندامی خوارترین پلەی هێندێ تیرەی سوارچاکێتی knighthood *adj* دواتر ◌ *n* 1 همراه، رفیق 2 شریک 3 لنگه 4 کتاب راهنما 5 کومپانیون *adj* بعدی

**companionable** /kəm'pænIənəbl/ *adjective*
ڕووخۆش، دۆستانە، مەشرەفخۆش، sociable ◊ *companionable people* :friendly ◌ *companionable laughter* خوش‌مشرب

**companionably** /-əbli/ *adverb*
ڕووخۆشانە ◌ به طور دوستانه

**companionableness** *noun*
ڕووخۆشی، مەشرەفخۆشی، خۆشمەشرەفی ◌ خوش‌مشربی

**companion ladder** = companionway

**Companion of Honor** *noun*
ئەنـدامی تیرەیێکـی سـوارچاکێتی، لـە 1917 دامەزرا ◌ عضو فرقه‌ای از شوالیه‌ها

**companionship** /kəm'pænIənʃIp/ *noun*
دانیشتن، دۆسـتایەتی، رفیقایـەتی، رەفیقایـەتی، هاوڕێیی، هەڤاڵەتی، یارێتی ◌ مصاحبت، رفاقت

**companionway** /kəm'pænIənweI/ *noun*
نەردیوانی کەشتی، (پێ)پلیکانی سەرکەشتی ◌ پلکان بر روی کشتی

**company** /'kʌmpəni/ *noun, pl.* companies
1 رفیقایەتی، دۆستایەتی، دراو، رەفیق، هاوڕێ، دۆست 2 میوان، میوانان 3 دۆستان، ناسیاوان، دەستە، کۆڕ، تیپ، گروپ 4 کۆڕی شانۆ یان هونەری 5 کۆمپانی، کۆمپانیا، نیوکۆیی، شیرکەت 6 (سەربازی) برەک، پەل، دەستە 7 (کەشتی) کارکەران ◌ 1 مصاحبت، رفیق 2 مهمان، مهمانان 3 دوستان، جمع 4 گروه نمایش یا هنری 5 شرکت 6 گروهان (نظامی) 7 خدمه

**comparability** /ˌkɒmpərə'bIləti, US ˌkɑːm-/ *noun*, also comparableness
1 لەبەراوردهاتوویی، پێکگیراوی، بۆ هەڵسەنگاندن دەبێ 2 لێکچوویی، هاوشێوەیی ◌ 1 مقایسه‌پذیری 2 تشابه

**comparable** /'kɒmpərəbl, US 'kɑːm-/ *adjective*
1 لەبەراوردهاتوو، پێکگیراو، هەڵدەسەنگێنرێ 2 هاوشێوە، لێکچوو: *fabrics of comparable quality* ◌ 1 مقایسه‌پذیر، سنجیدنی 2 مشابه

**comparably** /'kɒmpərəbli, US 'kɑːm-/ *adverb*
لەبەراوردهاتووانە، بە شێوەیێ کە بەراورد بکرێ، لە ڕووی بەراوردەوە ◌ به طور تطبیقی، در مقایسه

**comparative** /kəm'pærətIv/ *adjective, noun*
1 (ڕێزمان) بەراوردکاری‌یانە 2 بەریەکدەرانە، بەراوردکارانە، بەراوردی: *a comparative study of the educational systems of two countries* 3 *comparative anatomy* ◊ *a comparative stranger* :relative ڕێژەیی، 4 بەراورد 5 (ڕێزمان، ئاوەڵناو یان ئاوەڵکار) بەراورد، بەراوردەدەربڕ ◌ 1 تطبیقی 2 مقایسه‌ای 3 نسبی 4 تفضیلی 5 صفت تفضیلی

**comparative construction** *noun*
پێکهاتەی بەراوردکارانە ◌ ساخت تطبیقی

**comparative degree** *noun*
پلەی بەراورد ◌ درجه‌ی تفضیلی

**comparative grammar** *noun*
ڕێزمانی بەراوردی یان بەراوردکارانە ◌ دستور زبان تطبیقی

**comparative lingristics** *noun*
زمانەوانی بەراوردی یان بەراوردکارانە ◌ زبان‌شناسی تطبیقی

**comparatively** /kəm'pærətIvli/ *adverb*
1 بە شێوەیەکی بەراوردکاری‌یانە، بە بەراورد 2 تا ئەندازەیێ، تا ڕادەیێ، relatively ◌ 1 به طور تطبیقی 2 نسبتاً

**compare** /kəm'peə(r), US -'per/ *noun*
بەراوردکاری، بەرهەڤدان، هاوبەری، پێکگرتن، هەڵسەنگاندن: *beauty beyond compare* ◌ مقایسه، تطبیق

**comparison** /kəm'pærIsn/ *noun*
1 بەراوردکاری، بەرهەڤدان، هاوبەری، پێکگرتن، هەڵسەنگاندن 2 لێکچواندن، شوبهاندن 3 لێکچوون، لێکچوویی، هاوشێوەیی، similarity ◌ 1 مقایسه، تطبیق 2 تشبیه 3 شباهت

**compartment** /kəm'pɑːtmənt, US -'pɑːrt-/ *noun*
1 بەش، پارچە، کەرت، پشک، پاژ 2 (شەمەندەفەر) ژووروچکە، بەش، کووپە، خانە ◌ 1 قسمت، بخش 2 اتاقک، کوپه

**compartmentalization** *noun*
دابەشاندن، کەرتاندن، خانەخانەکردن، کەرتکەرتکردن، پارچەپارچەکردن، بەشبەشکردن ◌ تفکیک، قسمت‌بندی

**compartmentalized** *adjective*
خانەخانەکراو، پارچەپارچەکراو، بەشبەشکراو، کەرتکەرت، دابەشکراو، کەرتکەرتکراو ◌ تفکیک‌شده، بخش‌بخش‌شده

**compass** /'kʌmpəs/ *noun, adjective*
1 (هەروەها magnetic compass) لادوز(ە)، پوسڵە، قیبلەنوێن 2 پەرگار، پەرگاڵ، پرگار، جەغزێنگ، بازنەکێش 3 پانتایی، بەرینە، ڕاخستە، بوار، مەڵبەند، دەنگەوار؛ سنوور، سەرحەد، تخوب 4 توانست، توانایی، هێز ◌ 1

قطب‌نما 2 پرگار 3 گسترده، دامنه؛ ثغور 4 قدرت
**compass card** *noun*
پەیکەی لادۆز(ە) ○ گلباد
**compass course** *noun*
ڕێڕەوی مەگناتیسی ○ مسیر مغناطیسی
**compass error** *noun*
هەڵەی لادۆزە ○ خطای قطب‌نما
**compasses** *noun*
پەرگال، پرگار، پەرگار، بازنەکێش ○ پرگار
**compassion** /kəm'pæʃn/ *noun*
1 دلسۆزی، خەمخۆری، هاوسۆزی، بەبەزەیی 2 دڵ‌پێسووتان، پێ‌گوناهبوون، لاگوناح‌بوون، بەزەیی (پیاهاتن)، ڕوحم، ڕەحم ○ 1 رحم، همدردی 2 ترحم، شفقت
**compassionate** /kəm'pæʃənət/ *adjective*
دلسۆز، دڵ‌پێ‌سووتاو، خەمخۆر، بەبەزەیی، بەسۆز، بەڕوحم، بەڕەحم، دڵۆڤان: *a compassionate friend* ○ رحیم، دلسوز، شفیق
**compassionate leave** *noun*
مۆڵەتی تەنگەتاوی (لەبەر نەخۆشی یان مردنی خزمێ یان هۆیەکی خۆ) ○ مرخصی اضطراری
**compassionately** /kəm'pæʃənətli/ *adverb*
دلسۆزانە، لە ڕووی بەزەیی یان دلسۆزی‌یەوە ○ از روی ترحم
**compass point** *noun*
خاڵەکانی لادۆز، نیشانەی لادۆز (= هەر یەک لەو 32 نیشانە کە لەسەر ڕووی لادۆزن) ○ علامت قطب‌نما
**compatibility** /kəm,pætə'bɪləti/ *noun*
گونجان، سازان، کۆکبوون، ڕاهاتن، ڕێک‌کەوتن، جۆربوون، بۆبوون ○ سازگاری، هماهنگی، توافق
**compatible** /kəm'pætəbl/ *adjective*
سازاو، گونجاو، ڕاهاتوو، کۆک، ڕێک‌کەوتوو، جۆر، بۆبوو: *compatible ◊ -patible software blood groups* ○ سازگار، هماهنگ، موافق
**compatibly** /-əbli/ *adverb*
گونجاوانە، بە شێوەیەکی سازاو ○ با سازگاری
**compatriot** /kəm'pætriət, US -'peɪt-/ *noun*
هاونیشتمان، هاوڕێ، هەڤاڵ، companion، colleague ○ هم‌میهن، رفیق
**compatriotic** /kəm,peɪtrɪ'ɑ:tɪk/ *adjective*
هاونیشتمان ○ هم‌میهن
**compeer** /kəm'pɪə/ *noun*
هاوپلە، هاوپایە، هاوشان، هاوڕێزە، ئاوەڵپایە ○ هم‌پایە، همگن
**compellable** /kəm'peləbl/ *adjective*
(ماف، شایەت) ناچار دەکرێ، زۆری لێ‌دەکرێ، بەسەریدا دەسەپێنرێ ○ مجبورکردنی
**compellation** *noun*
ناو، سەرناو، لاتیو ○ اسم، لقب
**compelling** /kəm'pelɪŋ/ *adjective*
پێکەر، ناچارکەر، سەپێنەر، پێویست، سەرنج‌ڕاکێش، پتەو، بەهێز، بڕا، باوەڕپێ‌هێنەر، پێ‌سەلمێنەر، بەبڕشت، بەقەوەت، قایلکەر (بەڵگەهێنانەوە؛ **compellingly** /kəm'pelɪŋli/ *adv*) ○ وادارکننده، ضروری، جذاب، محکم
**compendious** /kəm'pendiəs/ *adjective*
کورتە، پوختە: *a compendious description* ○ موجز، مجمل
**compendiously** /kəm'pendiəsli/ *adverb*
بە کورتی ○ اجمالاً
**compendiousness** /kəm'pendiəsnəs/ *noun*
کورتی، پوختەیی، پوختی ○ اجمال
**compendium** /kəm'pendiəm/ *noun, pl.* -ndiums or compendia /-dɪə/
1 بابەت‌نامە، کورتەزانست‌نامە 2 کورتە، پوختە، پوخت ○ 1 کامپندیوم 2 خلاصه، ملخص
**compensable** /kəm'pɛnsəb(ə)l/ *adjective*
قەرەبوو دەکرێتەوە، پڕ دەبێتەوە، تۆڵەی دەکرێتەوە، تێهەڵ دەهێنرێتەوە ○ جبران‌پذیر
**compensating** *adjective*
هاوسەنگ ○ معادل
**compensation** /,kɒmpen'seɪʃn, US ,kɑ:m-/ *noun*
1 قەرەبوو(کردنەوە)، زیان‌دانەوە، تۆڵەکردنەوە، پڕکردنەوە، تێهەڵێنان: *to claim/award/receive compensation* 2 دەست‌پیاگێڕان، چاک‌کردنەوە 3 بۆبژاردن، پێ‌بژاردن، بژاردن، بژێرە، زیان‌بایی، قەرەبووانە، تاوان، تاوانە 4 حەق، حەق‌دەست، مووچە، پاداشت، 5 payment ,remuneration هاوسەنگی، پارسەنگی 6 سازان، گونجان ○ 1 جبران 2 ترمیم 3 پرداخت غرامت، غرامت، خسارت 4 اجرت، حقوق 5 موازنه 6 انطباق
**compensational** *adjective, also* compensative or compensatoty /,kɒmpen'seɪtəri, US kəm'pensətɔ:ri/
زیان‌دانەوەیی، تێهەڵێنانەوەیی، قەرەبووکردنەوەیی، تۆڵەکردنەوەیی ○ جبرانی، تعدیل‌کننده
**compensatory lengthening** *noun*
درێژکردنەوە یان کێشانەوەی زیان‌دانەوەیی یان قەرەبووکردنەوەیی، کێشانەوەی تێهەڵهێنەر (وەک *melan* "ڕەش" + *-s* یۆنانی کۆن کە بووەتە *melās* یا "بەهرام" و "بارام") ○ کشش جبرانی
**compère** /'kɒmpeə(r), US 'kɑ:mper/ *noun*
پێشکەش‌کار، بەڕێوەبەر (شانۆ، تەلەفزیۆن)، *to act as (a) compère* :emcee ○ مجری
**competence** /'kɒmpɪtəns, US 'kɑ:m-/ *noun*
1 توانایی، تواناداری، توان، توانمەندی، شیاوبوون، ڕایە، لێهاتوویی، سەردەرچوویی،

زانـایی، لیـزانی، لێوەشـاوەیی، شـارەزایی، وەستایەتی: *to gain a high level of -petence* ◊ *in English professional/technical*
2 *competence* توانایی مالی، دەس‌ڕۆیشتوویی مالی 3 (زمانەوانی) توانست: ئەو زانیاری و ئاگاییە knowledge کە توانایی دەداتە کەسێک تا بدوێ و (لە) زمانێک تێبگا؛ زانیاری ناخودئاگای کەسێک دەربارەی دەستوور و ڕێساکانی سازدانی ئاخافتن لە زمانی یەکەمی‌دا (لە بەرامبەر performance دا) 4 ئامادەیی بەکتریاکان سەبارەت بە کەوتنە بەر گۆڕانی بۆماوەیی genetic transformation ◇ 1 کفایت، لیاقت، شایستگی، صلاحیت، مهارت 2 قدرت مالی 3 (زبان‌شناسی) توانش 4 کومپتنس

**competency** /'kɒmpɪtənsi, US 'ka:m-/, *pl.* -etencies = competence

**competent** /'kɒmpɪtənt, US 'ka:m-/ *adjective*
بەتوانا، توانا، توان‌مەند، لێهاتوو، شارەزا، لێزان، زانا، سەرەندەرکردوو، سەردەرچوو، وەستا، شیاو، لێوەشاو، باش، پەسندکراو: *He's very competent in his work* ◇ قابل، باکفایت، شایسته، متبحر، صلاحیت‌دار، خوب

**competently** /'kɒmpɪtəntli, US 'ka:m-/ *adverb*
لێزانانە، شارەزایانە: *to perform -ly* ◇ متبحرانه

**competing** *adjective*
یەک‌نەگرەوە، دژبەیەک، پێکدژ ◇ متناقض، ضد و نقیض

**competition** /ˌkɒmpə'tɪʃn, US ˌka:m-/ *noun*
1 پێشبڕکێ، پێش‌بەزین، مل‌ملانێ، هاوملی، زۆرە(ئە)زمێ، ڕکەبەری، بەرامبەرکێ، تەنگەشە، کێبڕکێ، کێ‌بەرکێ، بەربەرەکێ، هاوچاوی، ڕقەبەرایەتی، بەربەرەکایەتی: *There is now intense competition between schools to attract students* ◊ *a music/photo, etc. competition* 2 نەیاران، هەڤرکان، ڕکەبەران: *We'll be able to assess the competition at the conference* ◇ 1 رقابت، مسابقه، هم‌چشمی، مبارزه 2 رقبا

**competition demand** *noun*
داخوازی پێشبڕکێ ◇ تقاضای رقابت

**competitive** /kəm'petətɪv/ *adjective*
ڕکەبەرانە، ڕقەبەرایەتی‌یانە، پێشبڕکێیی، پێشبڕکێ‌یانە، پێشبڕکێ‌خواز، پێشکەوتن‌خواز، پێشبڕکێ‌پێکراو، ئامادەی پێشبڕکێ، بەرزەفڕ ◇ رقابتی، رقابت‌آمیز، مسابقه‌ای، رقابت‌طلب، قادر به رقابت، بلندپرواز

**competitive advantage** *noun*
قازانجی ڕقەبەرایەتی یان پێشبڕکێیەتی، بەهرەی ڕقەبەرایەتی، خێری پێشبڕکێ‌دار ◇ سود رقابتی

**competitively** /kəm'petətɪvli/ *adverb*
بە شێوەیەکی ڕکەبەرانە: *competitively priced goods* ◇ به طور رقابتی

**competitiveness** /kəm'petətɪvnəs/ *noun*
ڕقەبەرایەتی، پێشبڕکێ، پێشبڕکێ‌خوازی: *the competitiveness of British industry* ◇ هم‌چشمی، رقابت‌طلبی

**competitive sports** *noun, pl.*
سپۆرت یان وەرزشە پێشبڕکێیەکان ◇ ورزش‌های رقابتی

**competitor** /kəm'petɪtə(r)/ *noun*
نەیار، هەڤرک: *our main/major competitor* ◇ رقیب، حریف

**competitory** *adjective*
پێشبڕکێیی، پێشبڕکێ‌یانە ◇ رقابت‌آمیز

**competitress** *noun*
نەیار، هەڤرک (ژن) ◇ رقیب

**compilation** /ˌkɒmpɪ'leɪʃn, US ˌka:m-/ *noun*
1 نووسین، دانان، ڕێکخستن، ئامادەکردن، ئامادەکاری، بەرهەڤکاری 2 کۆکردنەوە، خڕکردنەوە 3 کۆمەڵە 4 (کامپیوتێر) وەرگێڕان، کامپیلەیشن، کامپیلیشن ◇ 1 تألیف، تدوین، تهیه 2 گردآوری 3 مجموعه 4 هم‌گردانی

**compiler** /kəm'paɪlə(r)/ *noun*
1 نووسەر، دانەر 2 کۆکەرەوە 3 (کامپیوتێر) وەرگێڕ، کامپایلێر ◇ 1 مؤلف 2 گردآورنده 3 هم‌گردان

**complacency** /kəm'pleɪsnsi/ *noun*, also complacence
خەیاڵ‌ئاسوودەیی، باڵ‌لێدانەوە، خەیاڵ‌تەختی، ڕەزامەندی، خۆلاقایلی، لەخۆڕازیبوون: *Despite signs of an improvement in the economy, there is no room for -mplacency* ◇ رضایت خاطر، خشنودی از خود

**complacent** /kəm'pleɪsnt/ *adjective*
1 لەخۆڕازی، لەخۆبایی، خۆلاقایل، لەخۆقایل، ڕەزامەند، باڵ‌لێدەرەوە، قایل، پێخۆشبوو، ڕازی: *We must not become complacent about progress* 2 بەپۆزانە ◇ 1 مغرور، خشنود از خود، خرسند 2 مغرورانه

**complacently** /kəm'pleɪsntli/ *adverb*
بە پێخۆش‌بوونەوە، لە ڕووی ڕەزامەندی‌یەوە ◇ از روی رضامندی

**complainant** /kəm'pleɪnənt/ *noun*
دادخواز، داواکار، دادبەر، سکالاکەر، شکات‌کەر ◇ مدعی، شاکی

**complainingly** /kəm'pleɪnɪŋli/ *adverb*
بە گلەیی و گناشتەوە، بە بۆڵەبۆڵ، بە ناقایلی ◇ با اعتراض، با نارضایی

**complaint** /kəm'pleɪnət/ *noun*
1 شکات، سکالا، گازنده 2 گلەیی، گلەیی و گناشت، کزەونزە، ئاھ و نزوولە، بۆڵە، بۆڵەبۆڵ، خوتەخوت 3 نارەزایەتی، عەیب، ئیراد، رەخنە 4 دادخوازی، دادبەری، دادبردنەبەر 5 نەخۆشی، دەرد، ئازار ◌ 1 شکایت 2 گلە، غرولند 3 اعتراض، انتقاد 4 دادخواهی 5 بیماری
**complaisance** /kəm'pleɪzəns/ *noun*
گوێڕایەڵی، قسەبیسی، دڵنەرمی، دڵوڤانی، حازرخزمەتی، ئاسانگیری، خاکەڕایی ◌ اطاعت، مهربانی، آسانگیری، فروتنی
**complaisant** /kəm'pleɪzənt/ *adjective*
گوێڕایەڵ، گوێڕادێر، قسەبیس، حاڵی، بەگوێ، نەرم، دڵنەرم، سەرورووخۆش، بەخەڵکەوەبوو، حازرخزمەت، ئاسانگیر، خاکەڕا ( -plaisantly *adv*) ◌ مطیع، مهربان، آسانگیر، فروتن
**complement** /'kɒmplɪmənt, US 'kɑːm-/ *noun*
1 تەواوکەر، راپەڕێنەر، رەبەقکەر 2 ژمارەی تەواو 3 تێکڕا، هەموو، گشت: *We've taken our full complement of trainees this year* 4 (ڕێزمان) پاڵدراو، تەواوکەر (لە رستەکانی *'He became a politician'* و *'I'm angry'*، angry و politician تەواوکەرن) 5 کارکەران (کەشتی) ◌ 1 مکمل، متمم 2 عدد کامل 3 تمام، همه 4 مسند، متمم (دستور زبان) 5 خدمه
**complementary** /ˌkɒmplɪ'mentri, US ˌkɑːm-/ *adjective*, also -ntal
تەواوکەر (یەکتر): *complementary acute angles* (*adv* complementarily؛ complementariness *n*) ◌ مکمل
**complementary angle** *noun*
گۆشەی تەواوکەر ◌ زاویەی متمم
**complementary colour** *noun*, US complementary color
رەنگی تەواوکەر ◌ رنگ مکمل
**complementary medicine** = alternative medicine
**complete** /kəm'pliːt/ *adjective*
1 تەواو، رەبەق، تەخت، ئازگار: *We were in complete agreement* 2 کۆتاییپێهاتوو، تەواوکراو، راپەڕێنراو، سەرومڕ، بێکەموکوڕی، گشت، هەموو، یەکڕێ، سامەڵسا ◌ 1 کامل، تمام 2 پایانیافته، تمامعیار، همه
**completely** /kəm'pliːtli/ *adverb*
بەتەواوەتی، بە تەواوی، پاک، پێڤا، یەکجار، سەرپاکی: *The explosion* ◊ -*letely different completely destroyed the building* ◌ کاملاً
**completeness** /kəm'pliːtnəs/ *noun*
تەواوێتی، تەواوبوویی ◌ تمامیت، تمامشدگی
**complete vacuum** *noun*
(فیزیک) بۆشایی رەبەق یان تەواو ◌ خلأ کامل
**completion** /kəm'pliːʃn/ *noun*
1 تەواوکردن، بەسەرگەیاندن، دوایی(پێهێنان)، ئەنجام، سەروبەندبەستن، پێکهێنان، خەلاسکردن، بردنەسەر، کردن، راپەڕاندن، جێبەجێکردن 2 مۆرکردنی پەیمانی فرۆش، مۆرکردنی گرێبەست یان فرۆشنامە (بازرگانی) ◌ 1 تکمیل، اتمام، انجام 2 امضای قرارداد فروش
**completive** /kəm'pliːtɪv/ *adjective*
تەواوکەر ◌ مکمل
**complex** /'kɒmpleks, US kəm'pleks, 'kɑːm-/ *adjective, noun*
*adj* 1 ئاڵۆز، پێچەڵاوپێچ، سەخت، گرفت، دژوار، ئاریش، ئاسێ 2 تێکەڵاو، لێکدراو (رستە، ڕێزمان) 3 (بیرکاری) ئاوێتە *n* 1 کۆخانوو، کۆمەڵەخانووی لێکچوو 2 (دەروونناسی) گرێ، گرێک، کامپلێکس 3 (کیمیا) ئایۆن یان گەردێ کە لەودا یەک یان چەند کۆمەڵ بەهۆی بەندە هاوتەراز یان هاوپلەکانەوە بە گەردیلەیێکی کانزا دەبەسرێنەوە ◌ *adj* 1 پیچیده، مشکل 2 مرکب (جمله) 3 مختلط *n* 1 مجتمع 2 عقده 3 کامپلکس
**complex carbohydrate** *noun*
کاربۆهایدرایت یان کاربۆهیدریتی لێکدرا یان تێکەڵاو: polysaccharide ی (وەک نشاستە یان سێلۆلۆز) کە لە سەدان یان هەزاران یەکەی مۆنۆساکارید پێکهاتووە ◌ کاربوهیدرات مرکب
**complexion** /kəm'plekʃn/ *noun*
1 شێوە، رواڵەت، رەنگوروو، رەنگ، روخسار، دەموچاو، پێست 2 رووکەش، رووکار، بیچم، روخسار ◌ 1 چهره، پوست، بشره 2 ظاهر، شکل
**complexity** /kəm'pleksəti/ *noun*, also complicacy
ئاڵۆزی، پێچەڵاوپێچی، سەختی، دژواری، ئاریشی، گرفتی: *I was astonished by the size and* - *lexity of the problem* ◌ پیچیدگی، دشواری
**complex number** *noun*
(بیرکاری) ژمارەی ئاوێتە، ژمارەگەلێ بە شێوە و فۆرمی ($a + bi$) کە $a$ و $b$ ژمارە راستەقینەکانن و $i = \sqrt{-1}$ ◌ عدد مختلط
**complex sentence** *noun*
(ڕێزمان) رستەی لێکدراو (یان ئاوێتە) ◌ جملەی مرکب
**compliance** /kəm'plaɪəns/ *noun*
1 بەگوێکردن، گوێڕایەڵی، ملکەچی، ملنان، ملدان، قەبووڵکردن، رێککەوتن، قایلبوون، بەقسەکردن، پەسندکردن، کردن، conformity، obedience، cooperation، accordance: *in compliance with orders* ◊ *Compliance with the law is expected of all* 2 (فیزیک) شلی، نەرمی ◌ 1 اطاعت، پیروی، موافقت، قبول 2 کامپلیانس، وارفتگی

**compliant** /kəm'plaɪənt/ *adjective*
1 گوێڕایەڵ، لەگوێگر، بەگوێ، ملکەچ، ملدەر، پابەند، بەقسەکەر، پەسندکەر، قەبووڵکەر، ئامادەی قەبووڵکردن :submissive *a corrupt regime aided by a compliant press* 2 خۆگونجاندوو، ڕێککەوتوو، ڕێککەوتە: (compliantly *adv*) *compliant software* ۞ 1 مطیع، قبول‌کننده، فرمانبردار 2 کامپلیانت

**complicate** /'kɒmplɪkɪt/ *adjective*
ئاڵۆز، ئاڵۆسکاو، پێچەڵاوپێچ ۞ بغرنج، پیچیده

**complicated** /'kɒmplɪkeɪtɪd, US 'kɑːm-/ *adjective*
ئاڵۆز، پێچەڵاوپێچ، پێچاوپێچ، سەخت، ئاڵۆسکاو، ئاڵاو، گرێگرێ، گرفت، دژوار، گران، پڕکێشە، ئاسێ ۞ پیچیده، بغرنج، مشکل

**complication** /ˌkɒmplɪ'keɪʃn, US ˌkɑːm-/ *noun*
1 ئاڵۆزی، پێچەڵاوپێچی، پێچاوپێچی، ئاڵاوی، ئاڵۆسکاوی، سەختی، کێشە، گرانی، گرفت، قورت، دژواری، گرفتی، گیری، گرفتاری، گیروگرفت، تووشی، تووشبوون 2 (complications) نەخۆشی لاوەکی یان دووهەم، لانەخۆشی (نەخۆشییێ کە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکی تر گرانتر دەکا) ۞ 1 پیچیدگی، بغرنجی، اشکال، مسأله، گرفتاری 2 (در جمع) عوارض

**complicity** /kəm'plɪsəti/ *noun, pl.* complicities
هاودەستی، دەستتیابوون، بەشداری لە تاواندا ۞ مشارکت در جرم

**complier** /kəm'plaɪə(r)/ *noun*
قەبووڵکەر، گوێڕایەڵ، ملنەر، حاڵی ۞ قبول‌کننده

**compliment** /'kɒmplɪmənt, US 'kɑːm-/ *noun*
1 پیاهەڵدان، تاریف(دان)، پەسن، ستایشت 2 ڕێز، حورمەت 3 ڕووپامایی، زمانلووسی 4 (compliments) سڵاو، چاکوخۆشی ۞ 1 تمجید، ستایش 2 احترام 3 تملق 4 (در جمع) درود

**complimentary** /ˌkɒmplɪ'mentri, US ˌkɑːm-/ *adjective*
1 پەسناوی، تاریفدەرانە، پیاهەڵدەرانە: *a complimentary remark* 2 خۆڕایی، بەلاش: *-limentary tickets* ۞ 1 ستایش‌آمیز 2 رایگان

**compline** /'kɒmplɪn, US -ʌɪn/ *noun*
1 ئاهەنگی شێوان 2 دۆعا و نزای شێوان، خواپاڕانەوەی شێوان (لە کلیسەی ئینگلیکاڵ و کاسۆلیکی ڕۆمان) ۞ 1 مراسم شامگاهی 2 دعای شامگاهی

**complot** /'kɒmplɑːt/ *noun*
پیلان، سازوباز، گەلەکۆمە ۞ دسیسه، توطئه

**compo** *noun, pl.* compos
مەتریاڵ یان کەرەسەی تێکەڵە یان ئاوێتە، ماک یان مادەی ئاوێتە ۞ مادەی کمپوزیت

**component** /kəm'pəʊnənt, US -'poʊ-/ *adjective, noun*
*adj* دروستکەر، پێکهێنەر، پێکنەر، سازێنە، سازکەر، سازندە، دامەزرێنەر *n* پارچە، تیکە، تۆخم، کەرت، بەش (پێکهێنەر): *Trust is a vital component in any relationship* ◊ *an important -onent of the program* *adj* ۞ تشکیل‌دهنده، مؤلفه، سازنده *n* قطعه، جزء، بخش

**componential analysis** /ˌkɒmpə'nenʃ(ə)l/ *noun*
(زمانەوانی) شیکردنەوەی پێکهێنەرانە (- شیکردنەوەی واتای وشەیێ یان یەکەیێکی تری زمانی بۆ پێکهێنەرە واتاییە جیاکان) ۞ تجزیه‌ی مؤلفه‌ای

**componential definition** *noun*
(زمانەوانی) پێناسە یان ناساندنی شیکردنەوەیی ۞ تعریف تحلیلی

**componential semantics** *noun*
(زمانەوانی) واتاناسی شیکردنەوەیی، واتاناسیی شیکارییانە ۞ معناشناسی تحلیلی

**comportment** /kəm'pɔːtmənt, US -'pɔːrt-/ *noun*
1 ڕەوتار، ڕەفتار، هەڵسوکەوت، جووڵانەوە: *She won admiration for her comportment during the trial* 2 سازان، گونجان ۞ 1 رفتار 2 سازگاری

**composed** /kəm'pəʊzd, US -'poʊzd/ *adjective*
1 دروسکراو، پێکهاتوو، پێکهێنراو، سازاو، سازێنراو، دامەزراو: *The committee is -posed mainly of lawyers* 2 ئارام، خۆدار، لەسەرەخۆ ۞ 1 ترکیب‌شده، تشکیل‌شده 2 متین

**composedly** /kəm'pəʊzdli, US -'poʊzdli/ *adverb*
بە لەسەرەخۆیی، بە شێنەیی، ئارام ۞ به متانت

**composedness** /kəm'pəʊzdnəs, US -'poʊzdnəs/ *noun*
لەسەرەخۆیی، خودداری، مەندی، ئارامی ۞ متانت

**composer** /kəm'pəʊzə(r), US -'poʊz-/ *noun*
ئاوازدانەر ۞ آهنگساز

**composing** /'kəmpəʊzɪŋ/ *noun*
1 پیتچنی 2 پێکهێنان 3 ڕێکی(وپێکی) ۞ 1 حروفچینی 2 ترکیب 3 نظم

**composing machine** *noun*
پیتچنە(ک)، دەزگای پیتچنی ۞ ماشین حروفچینی

**composing room** *noun*
ژووری پیتچنی ۞ اتاق حروفچینی

**composite** /'kɒmpəzɪt, US kəm'pɑːzət/ *adjective, noun*

*adj* 1 پێکهاتوو، پێکهاتە، تێکەڵ، تێکلاو، تێکەلاو، لێکدراو، سەرجەم: *a composite picture* 2 (Composite) تێکەڵە، ئاوێتە (تێکەڵەیێ لە ڕەگەز و توخمی بیناسازی Ionic و Corinthian) 3 /زۆرتر /'kɒmpəzʌɪt/ (ڕووەکناسی) سەربە یان ئاماژە بەو ڕووەک و گیایانەی خێزانی Compositae. سەربە یان پێوەندی بە خێزانی (گیا)ئاوێتەوە (کامپۆزیتەوە) هەیە *n* 1 تێکەڵە، ئاوێتە، شتێکی پێکهاتوو یان لێکدراو، شتێکی تێکەلاو یان تێکەڵ 2 /زۆرتر /'kɒmpəzʌɪt/ (ڕووەکناسی) ڕووەکێ لە خێزانی چاوبشیلە daisy (Compositae) 3 وێنە، کێشراوە یان شتێکی وا کە لە چەندین وێنە و ئیمازی جیا پێکهاتووە ◌ *adj* 1 مرکب، مختلط، کلی 2 ترکیبی 3 وابستە بە خانوادەی گیاهان مرکب *n* 1 آمیزە، ترکیب، چیز مرکب 2 گیاهی از خانوادەی گیاهان مرکب

**composition** /ˌkɒmpə'zɪʃn, US ˌkɑːm-/ *noun*

خێزانی گیائاوێتەکان یان گیائاوێتان: خێزانە ڕووەکێکی بەربڵاو و جۆراوجۆر، بریتین لە: aster ەکان، چاوبشیلەکان daisy، شەلەمکەرەکان dandelion، شەشپەرەکان marigold، گوڵەبەڕۆژەکان sunflower، کەرتەشییەکان thistle و گوڵەپاییزەکان zinnia ◌ خانوادەی گیاهان مرکب

**composition** /ˌkɒmpə'zɪʃn, US ˌkɑːm-/ *noun*

1 پێکهێنان، دانان، پێکەوەنان، دروس‌کردن، هەڵبەستن: *the chemical composition of the soil* ◊ *the composition of the board of directors* 2 بەرهەم، شوێنەوار (ئاواز، هەڵبەست، کتێب و هتد) 3 ئاوازدانان 4 ئینشا (خوێندنگا) 5 نووسین، نفیسین 6 پیت‌چنی 7 ڕێکخستن 8 سروشت، خۆرسک، بوون 9 شتی پێکهاتوو 10 ڕێککەوتن، سازان، قەراروبڕی، قەرارومەدار 11 کەرەسە یان مەتریاڵی دەسکرد 12 پێکهێنانی پیشەسازی، ڕێکخستنی هونەری 13 پارچە موسیقا (*adj* compositional؛ *adv* compositionally) ◌ 1 ترکیب، ساخت 2 اثر 3 تصنیف 4 انشا 5 نگارش 6 حروف‌چینی 7 ترکیب‌بندی 8 طبیعت، وجود 9 چیز مرکب 10 توافق، قرار و مدار 11 مادەی مصنوعی 12 آرایش هنری 13 قطعەی موسیقی

**compositive** /kəm'pɒzɪtɪv/ *adjective*

پێکهێنەرانە، پێکەوەنەرانە، پێکهێنەر، لێکدەر ◌ ترکیبی، ترکیب‌کنندە

**compositor** /kəm'pɒzɪtə(r), US -'pɑːz-/ *noun*

پیتچن، پیت‌چن ◌ حروف‌چین

**compos mentis** /ˌkɒmpəs 'mentɪs, US ˌkɑːm-/ *noun*

(لاتین، نافەرمی یان بۆ گاڵتە) ژیر، ساغ، ئاقڵ ◌ عاقل

**compost** /'kɒmpɒst, US 'kɑːmpoʊst/ *noun*

1 پەیێنک(لێکدراو یان تێکەڵ)، پەیێنە (ب.ت. لە گەڵای دار) 2 تێکەڵە، compound mixture ◌ 1 کود 2 آمیزە

**composure** /kəm'pəʊʒə(r), US -'poʊ-/ *noun*

قورسی، مەندی، سەنگینی، خودداری، لەسەرەخۆیی، ئارامی، هێمنی: *to keep/lose/recover/regain your composure* ◌ وقار، خودداری، متانت

**compotator** /kɑːmpəʊteɪtə(r)/ *noun*

پێکەوەخۆرەوە، هاوپیالە ◌ هم‌پیالە

**compote** /'kɒmpɒt, US 'kɑːmpoʊt/ *noun*

1 خۆشاو 2 خۆشاوخۆری ◌ کمپوت

**compound**[1] /'kɒmpaʊnd, US 'kɑːm-/ *noun, adjective*

*n* 1 پێکهاتە، دارشتە، تێکەڵە، لێکدراو، ئاوێتە 2 وشەی لێکدراو *adj* 1 (ڕستە) ناسادە، لێکدراو 2 پێکهاتە، پێکهێنراو، پێکهاتوو، ئاوێتە ◌ *n* 1 ترکیب، آمیزە، مخلوط 2 واژەی مرکب *adj* 1 مرکب (جملە) 2 ترکیبی

**compound**[2] /'kɒmpaʊnd, US 'kɑːm-/ *noun*

ناوچەی دەورگیراو، حەوشە، دیواربەند(ان، کەمپی میلیتاری یان زیندان، بە دیوار یان پەرژین) ◌ محوطه

**compounded** *adjective*

پێکهاتوو، دروس‌کراو، دامەزراو، پێکهاتە، پێکەوەنراو ◌ ترکیب‌شدە

**compound engine** *noun*

مۆتۆری لێکدراو یان ئاوێتە ◌ موتور مرکب

**compound eye** *noun*

چاوی لێکدراو یان تێکەڵ؟ (بڕوانە simple eye) ◌ چشم مرکب

**compound fraction** *noun*

کەرتی ئاوێتە یان لێکدراو ◌ کسر مرکب

**compound fracture** *noun*

شکانی سەخت، گردەبڕ ◌ شکستگی مرکب

**compound interest** *noun*

سوود یا بەهرەی ئاوێتە یا لێکدراو ◌ بهرەی مرکب

**compound leaf** *noun*

گەڵای ئاوێتە ◌ برگ مرکب

**compound pulley** *noun*

خلۆکەی لێکدراو یان تێکەڵ (ئاوێتە) ◌ قرقرەی مرکب

**compound quantity** *noun*
بڕی ئاوێته یان لێکدراو ۞ کمیت مرکب

**compound ratio** *noun*
ڕێژەی ئاوێته یان لێکدراو ۞ نسبت مرکب

**compound sentence** *noun*
ڕستەی لێکدراو ۞ جملەی مرکب

**comprehensibility** /ˌkɒmprɪˌhensəˈbɪləti, US ˌkɑːm-/ *noun*, also comprehensibleness
لەتێگەیشتنهاتوویی ۞ درکپذیری

**comprehensible** /ˌkɒmprɪˈhensəbl, US ˌkɑːm-/ *adjective*
لەتێگەیشتنهاتوو، لە تێگەیشتن دێ: *easily/readily comprehensible to the average reader* ۞ درکپذیر

**comprehensibly** /ˌkɒmprɪˈhensəbli, US ˌkɑːm-/ *adverb*
بە ڕوونی، بە شێوەیێ کە بتوانی لێی تێبگەی ۞ بە وضوح

**comprehension** /ˌkɒmprɪˈhenʃn, US ˌkɑːm-/ *noun*
1 تێگەیشتن، حاڵیبوون، فام، سەرەندەرکردن، پێزانین، سەرەدەری 2 داگرتن، لەخۆگرتن، گرتنەوە، بەرکەوتن، تیابوون، گشتگیری 3 مەشقی تێگەیشتنی بابەتێ ۞ 1 فهم، درک، ادراک 2 شمول 3 کامپرهنسیون

**comprehensive** /ˌkɒmprɪˈhensɪv, US ˌkɑːm-/ *adjective, noun*
*adj* بەرین، بەربڵاو، گشتلایەنە، هەمووگر، هەمەلایەنە، سەراپاگیر، بەرفراوان، inclusive: *n comprehensive examinations* خوێندنگای ئامادەی گشتگر، خوێندنگای کۆتایی گشتگر ۞ *adj* وسیع، گسترده، جامع *n* دبیرستان جامع

**comprehensively** /ˌkɒmprɪˈhensɪvli, US ˌkɑːm-/ *adverb*
بە تەواوەتی، گشتگرانە ۞ کاملاً، بە طور جامع

**comprehensive insurance** *noun*
بیمەی گشتگر یان گشتلایەنە ۞ بیمەی جامع

**comprehensive school** *noun*
خوێندنگای ئامادەیی گشتگر یان گشتگیر ۞ دبیرستان جامع

**compress** /ˈkɒmpres, US ˈkɑːm-/ *noun*
(پزشکی) کامپرێس، ڕەوێنە(رە)، خاوکەرەوە، خاولەی تەڕ ۞ کمپرس

**compressed** *adjective*
پەستێنراو، پەستێوراو، پەستاوتە، پەستراو، شێلراو، گوشراو، ئاخنراو، کەڵەکەکراو، چڕەوەبوو (compressedly *adv*) ۞ فشرده، متراکم

**compressed air** *adjective*
هەوای پەسراو یان پەستێنراو ۞ هوای متراکم

**compressible** /kəmˈprɛsɪb(ə)l/ *adjective*
لەپەستانهاتوو، دەپەستێورێ، دەپەسێورێ (compressibility /-ˈbɪlɪti/ *n*: لەپەستانهاتوویی) ۞ تراکمپذیر

**compression** /kəmˈpreʃn/ *noun*, also compressure
1 پەستان، داگرتن، پەستاوتن، پەسواندن، داتەپاندن، گوشاردان، گڤاشتن، گوشین، باڵیەکنان، داشێلان، پەسێوراوی، داتەپیوی، داشێلاوی 2 گوشار، پەستان 3 کورتی، پوختی ۞ 1 فشردگی، بەهمفشردن، تراکم 2 فشار 3 ایجاز

**compression spring** *noun*
زەمبەلەکی پەستانی یان گوشاری ۞ فنر فشاری

**compressive** /kəmˈprɛsɪv/ *adjective*
پەستانی، پەسوێنەرانە، پەستێنەرانە ۞ تراکمی

**compressor** /kəmˈpresə(r)/ *noun*
پەستێنە (هەوا یان گازەکانی تر) ۞ کمپرسور

**comprisal** /kəmpˈraɪzəl/ *noun*
1 داگرتن، لەخۆگرتن، لەبەرگرتن، تیابوون، گرتنەوە، بەرکەوتن 2 کورتە ۞ 1 اشتمال 2 خلاصه

**comprising** *adjective*
داگر، تیابوو، لەخۆگر ۞ شامل

**compromise** /ˈkɒmprəmaɪz, US ˈkɑːm-/ *noun*
1 ڕێککەوتن، سازان، پێکهاتن، هاوکۆکی، تەبایی، ئاشتی: *a compromise solution* 2 نێو(ان)گیری ۞ 1 توافق، سازش 2 حد وسط

**compromising** /ˈkɒmprəmaɪzɪŋ, US ˈkɑːm-/ *adjective*
نێوزڕێن، ئابڕووبەرە، عەیب، ڕووڕەشێنەر: *compromising photos* ۞ بدنامکننده

**compte rendu** /ˌkɔ̃t rɑ̃ˈdjuː, French kɔ̃t ʀɑ̃dy/ *noun*, comptes rendus pronunc. same
ڕاپۆر یان پیاچوونەوەی فەرمی ۞ گزارش یا بازنگری رسمی

**comptometer** /kɒmpˈtɒmɪtə(r)/ *noun*
ئامێری ژماردن، ژمێرەک ۞ ماشین حساب

**comptroller** /kənˈtrəʊlə(r), US -ˈtroʊ-/ *noun*
سەرژمێریار، سەرۆکی ژمێریاری ۞ رئیس حسابداری

**compulsion** /kəmˈpʌlʃn/ *noun*
زۆر، سەنگی، هەڵپێچان، پشتەملە، پشتەملێ، تەنگەتاو، جەور، ناچارکردن، زۆرەملێ، زۆری، زۆردارەکی، بەدەس خۆنەبوو: *The legal system is based on -ulsion* ۞ زور، اجبار، بیاختیاری

**compulsive** /kəmˈpʌlsɪv/ *adjective*
بەزۆری، زۆردارەکی، زۆرەکی، خۆنەویست: ◊ *compulsive eating/spending/gambling compulsive actions* ۞ بلااراده، اجباری

**compulsively** /kəmˈpʌlsɪvli/ *adverb*

بــە زۆری، زۆردارەکــی، بــە تــۆپزی، ناچارانــە، خۆنەویست ۞ بی اختیار
**compulsorily** /kəm'pʌlsərəli/ *adverb*
بە ناچاری، بە زۆری، زۆرەملی‌یانە، بە تۆپزی، دەگەنەکی ۞ اجباراً
**compulsory** /kəm'pʌlsəri/ *adjective*
تەوزیمی، زۆرەملی، زۆرەملی، خۆنەویستوویی، خۆنەویستی، زۆری، زۆردارەکی: *compulsory retirement* ۞ اجباری، بلااراده، قهری
**compunction** /kəm'pʌŋkʃn/ *noun*
پەشیمانی، پاشگەزی، فەرگەر، نارەحەتی ویژدان یان دەروون، داخ، ئاخ‌وداخ(هەڵکێشان)، هەست بە گوناهـ بەگوناهزانی، بێ‌گوناهی ۞ ندامت، پشیمانی، ندای وجدان، افسوس، احساس گناه
**compunctious** /kəm'pəŋkkʃəs/ *adjective*
پەشیمان، پەشیمان‌کەرەوە، بێ‌گوناهـ ۞ پشیمان، نادم
**compurgation** /ˌkɒmpɔ:'geɪʃ(ə)n/ *noun*
پاکانە، پاک‌بوونەوە (بە سوێندی شایەدەکان) ۞ تبرئه
**compurgator** /'kɒmpə:geɪtə/ *noun*
شایەدی پاکانە ۞ شاهد تبرئه
**computability** /kəmˌpju:tə'bɪləti/ *noun*
لــەژماردن‌هــاتوویی، لەلێکدانــەوەهاتوویی ۞ قابلیت حساب، محاسبه‌پذیری
**computable** /kəm'pju:təbl/ *adjective*
لــەژماردن‌هــاتوو، لەلێکدانــەوەهاتوو ۞ قابــل حساب، محاسبه‌پذیر
**computation** /ˌkɒmpju'teɪʃn, US ˌkɑ:m-/ *noun*
ژمــاردن، ژمێــرە، ئــەژمــار، لێکدانــەوە، هەڵــەنگاندن، قەبلاندن، مەزنە: *an error in the computation* ۞ حساب، محاسبه
**computational** /ˌkɒmpju'teɪʃənl, US ˌkɑ:m-/ *adjective*
کــامپیوتێری، لێکدانــەوەیی، لێکدەرەوانــە: *a computational approach* ◊ *computational methods* ۞ رایانه‌ای، محاسبه‌ای
**computational linguistics** *noun*
زمانــەوانی کــامپیوتێری یــان لێکدانــەوەیی ۞ زبان‌شناسی رایانه‌ای
**computator** *noun*
ئامێری ژماردەن، پێژمێر، ژمێرەر ۞ ماشین حساب
**computer** /kəm'pju:tə(r)/ *noun, adjective*
*n* کــامپیوتێر *adj* کــامپیوتێری ۞ *n* کــامپیوتر، رایانه *adj* رایانه‌ای
**computerate** /kəm'pju:tərət/ *noun*, computer literate
**computer game** *noun*
کایە یان یاری کامپیوتێری ۞ بازی کامپیوتری
**computerization** /kəmˌpju:təraɪ'zeɪʃn, US -rə'z-/ *noun*
کامپیوتێرانــــدن، کـــــامپیوتێری کـــــردن، کردنەکامپیوتێری ۞ کامپیوتری کردن
**computerized** *adjective*
کامپیوتێری(کراو) ۞ کامپیوتری‌شده
**computer literacy** *noun*
کامپیوتێربەکارهێنی، بەکارهێنانی کــامپیوتێر ۞ کاربرد کامپیوتر
**computer literate** *noun*
کامپیوتێربەکارهێنەر، بەکارهێنەری کامپیوتێر ۞ کاربر کامپیوتر
**computer science** *noun*
کامپیوتێرناسی، زانستی کامپیوتێر ۞ علم کامپیوتر
**computer scientist** *noun*
کامپیوتێرناس، زانای کامپیوتێر ۞ عالم کامپیوتر
**computer virus** *noun*
ڤایرۆس یا خۆرەی کامپیوتێر ۞ ویروس کامپیوتر
**computing** /kəm'pju:tɪŋ/ *noun, adjective*
*n* 1 کامپیوتێرکــاری، کــارکردن بــە کــامپیــوتێر، بەکارهێنانی کامپیوتێر: ◊ *to study computing educational/network/scientific computing* 2 لێکدانەوە *adj* سەربە کــامپیوتێر، کــامپیوتێری، ۞ *n* 1 کاربرد کامپیوتر، استفاده از کامپیوتر ۞ 2 محاسبه *adj* وابسته به کامپیوتر
**comrade** /'kɒmreɪd, US 'kɑ:mræd/ *noun*
هــاورێ، هەڤــاڵ، ئــاوەڵ، بــرادەر، هاوخــەبات، هاورێیــاز: *We must fight for our rights, comrades!* ۞ رفیق، هم‌قطار
**comrades** *noun, pl.*
چەپگرەکان، کۆمونیستەکان ۞ کمونیست‌ها
**comrade-in-arms** *noun*
هاوســەنگەر، هاورێبــاز، هەڤاڵــی ســەربازی ۞ هم‌رزم
**comradely** /'kɒmreɪdli, US 'kɑ:mrædli/ *adverb*
دۆستانە، هەڤاڵانە ۞ دوستانه
**comradeship** /'kɒmreɪdʃɪp, US 'kɑ:mræd-/ *noun*, also comradery /'kɒmreɪdəri/
دۆســتایەتی، رفیقایــەتی، رەفیقایــەتی، ئاوەڵــی، هاورێیەتی، هاورێیازی، هاوخــەباتی ۞ رفاقــت، هم‌قطاری
**Comsat** *noun*
(دروشمــی بازرگــانی) ســاتەلایتی زانیــاری‌نێــر، ساتەلایتی گەیێنەر ۞ ماهواره‌ی مخابراتی
**Comtian** *adjective, noun*, also Comtean
1 سەربە Auguste Comte یا ریبازەکــانی (یان بیروباوەری فەلسەفی ئەو) 2 کۆنتی، لایەنگر یان شوێن‌کەوتووی فەلسەفەی ئە(و)گۆست کۆنت ۞ کنتی
**Comtism** *noun*

کۆنتباوەڕی، کۆنتیزم ◌ کنت‌گرایی
**Comtist** *noun, adjective*
1 کۆنتباوەڕ، کۆنتیست 2 کۆنتیستی ◌ 1 کنت‌گرا 2 کنت‌گرایانه
**con**[1] /kɒn, US kɑ:n/ *noun, adjective*
*n* کەڵەک، فێڵ، فریو، دەسبڕی، زۆڵی (بۆ بەدەس‌هێنانی باوەڕی خەڵک) *adj* فرۆفێڵاوی، درۆزنە ◌ *n* حقه، شیادی *adj* قلابی
**con**[2] *adverb or preposition, noun*
*adv* دژی، بە دژی *n* دەنگی دژایەتی ◌ *adv* علیه *n* رأی مخالف
**Con** *abbreviation* Conservative
**con-** = com-
**conation** /kə'neɪʃn/ *noun*
1 ویست، ئیرادە 2 volition حەوڵ، تێکۆشان ◌ 1 اراده 2 کوشش
**conational** *adjective*
ویستی، ئیرادەیی، سەربە ویست ◌ وابسته به اراده
**conatus** *noun*
حەوڵ، هەوڵ، کردوکۆش، ویست، بزوێنە، پاڵنەر ◌ کوشش، انگیزه
**concatenate** /kən'katɪneɪt/ *adjective*
پێکەوەبەستراو، لێک‌هەڵپێکراو، زنجیرەئاسا، لێک‌بەند، پێک‌بەست ◌ متسلسل
**concatenation** /kən,kætə'neɪʃn/ *noun*
1 زنجیرەیی، پێوەستی، پێک‌بەستی، لێک‌بەندی، پێکەوەبەستراوی، لێک‌هەڵپێکراوی، یەک‌لەدوای‌یەک‌بوون 2 زنجیرە (بنەڕەت: لە late Latin *concatenare* ،*concatenat-* "پێکەوە بەستن") ◌ 1 تسلسل، توالی 2 رشته
**concave** /kɒn'keɪv, US kɑ:n'k-, 'kɑ:n-/ *adjective, noun*
*adj* رووچاڵ، چاڵ، کاس، قوپاو، قوپیو: *a concave lens/mirror* *n* هێڵ یا روو و ئاستێکی رووچاڵ یان قوپاو، هێڵ یان رووی کاس ◌ *adj* کاو، مقعر، تورفته *n* خط یا سطح مقعر
**concavity** /,kɒn'kævəti, US kɑ:n-/ *noun, pl.* concavities
رووچاڵی، چاڵی، کاسی، قوپیوی، قوپاوی، hollow؛ ئاست یان رووێکی رووچاڵ یان قوپاو: *Rocks exposed to wind often show some degree of concavity* ◌ تورفتگی، کاوی، تقعر؛ سطح مقعر
**concavo-concave** *adjective*
دوولاچاڵ، دوولاقوپاو ◌ مقعرالطرفین
**concavo-convex** *adjective*
رووچاڵ و رووقیت، چاڵ و قۆقز، کاس و قۆقز ◌ مقعر و محدب
**concealable** /kən'si:ləbl/ *adjective*
لەحەشارهاتوو، دەشاردرێتەوە، لەشاردنەوەهاتوو ◌ پنهان‌کردنی

**concealed** *adjective*
بزر، شاراوە، حەشاردراو، نادیار ◌ مخفی
**concealment** /kən'si:lmənt/ *noun*
1 حەشار، شاردنەوە، حەشاردان، ژێرەوکردن، بزرکردن، لەبەرچاولابردن، ژێرەوکردن، فەشارتن، داپۆشین، مەلاس‌دان: *the concealment of crime* ◊ *Many animals rely on concealment for protection* 2 حەشارگە، پەنا، پەناوپەسیو ◌ 1 اختفا، پنهان‌کاری 2 مخفی‌گاه
**conceit** /kən'si:t/ *noun*
1 پۆز، دەمار، دەعیە، خۆپەسندی، بەعێنوانی، بۆنگی، فیز، قونەت، ترۆفیز، ترزلی، خۆپێزلی، لەخۆباییبوون، خۆلێ‌گۆڕان 2 وازانین، وادانان، پێ‌وابوون، بیرۆکە، بیری خەیالاوی یا پڕوپووچ 3 thought راگوێست، مێتافۆر، خوازە، راگوێستی سەیر یان ئاڵۆز metaphor (هەڵسەنگاندن نێوان دوو شت دەگرێتەوە؛ out of conceit with: بێزراو لە، بێزار لە، لەبەرچاوکەوتوو) ◌ 1 غرور، تکبر، نخوت 2 پندار، اندیشه، اندیشه‌ی بی‌اساس 3 استعاره، استعاره‌ی عجیب یا پیچیده
**conceited** /kən'si:tɪd/ *adjective*
بەفیز، خۆپێزل، بەدەعیە، بۆنگ، ترزل، بەعێنوان، لووت‌بەرز، بەپۆز، بەترۆتۆپ، خەرۆ، بەدەمار، لەخۆدەرچوو، لەخۆبایی، خۆپەسند، لەخۆڕازی، بۆنگ (conceitedness *n*): *It's very conceited of you to assume that your work is always the best* ◌ مغرور، متکبر، خودپسند
**conceitedly** /kən'si:tɪdli/ *adverb*
لەخۆباییانە، بەدەمارانە، لووت‌بەرزانە ◌ از روی غرور
**conceivability** /kən,si:və'bɪləti/ *noun*
باوەڕپێکراوی، لەباوەڕهاتوویی، لەکردنهاتوویی ◌ قابلیت تصور، امکان
**conceivable** /kən'si:vəbl/ *adjective*
باوەڕپێکراو، لەباوەڕهاتوو، بۆی هەیە، لەکردنهاتوو، لەوەدەچێ، دەکرێ، دەهێنرێتە پێش‌چاو: *every conceivable combination* ◌ قابل تصور، ممکن
**conceivably** /-əbli/ *adverb*
رەنگە، دەشێ، رێی تێدەچێ، بۆی هەیە، لەوەدەچێ: *we could conceivably finish next week* ◌ احتمالاً، به طور قابل تصور
**concelebration** *noun*
دوعا و نزای بەکۆڕ، خواپاڕانەوەی بەکۆمەڵ ◌ دعای دسته‌جمعی
**concentrate** /'kɒnsntreɪt, US 'kɑ:n-/ *noun*
1 شیلە، ئاوگ: *orange juice concentrate* 2 مەتریالی خەستەوەبوو، شلەی خەستەوەبوو یان خەستەوەکراو) ◌ 1 عصاره 2 ماده یا مایع غلیظ‌شده
**concentrated** /'kɒnsntreɪtɪd, US 'kɑ:n-/ *adjective*

1 کۆوەبوو، چڕەوەبوو، چڕ، خەست، پەیت، خەستەوەبوو، تیر: *a concentrated solution of salt in water* 2 تونـد، سـەخت

concentratedly /'kɒnsntreɪtɪdli, US 'kɑ:n-/ *adv* ◌ 1 متمرکز، غلیظ 2 شدید

**concentration** /ˌkɒnsn'treɪʃn, US ˌkɑ:n-/ *noun*

1 کۆکردنـەوە، خڕکردنـەوە 2 هـۆش‌پێـدان، سەرنج‌پێدان، تەواو گوێ‌پێدان 3 خەستی، پەیتی، تیری: *glucose concentrations in the blood* 4 خەست‌کردن(ەوە)، خەستاندن ◌ 1 تمرکز، تراکم 2 تمرکز حواس 3 غلظت 4 غلیظ‌سازی

**concentration camp** *noun*

کەمپی کاری زۆرەملێ یا بێگاری، سەربازگەی گرتن (ب.ت. لە ئەڵمانیای نازی، گیراوانی شەڕ و زیندانی‌یە سیاسی‌یەکان) ◌ اردوگاه اجباری

**concentration polarization** *noun*

جەمسەرگری خەستی یا پەیتی ◌ قطبش غلظتی

**concentric** /kən'sentrɪk/ *adjective*, also concentrical

هاوناوەند، یەک‌ناوەند، هاوچەق: *cocentric rings* ◌ هم‌مرکز، متحدالمرکز

**concentrically** /kən'sentrɪkli/ *adverb*

هاوناوەندانە، بە شێوەیەکی هاوناوەند ◌ به طور هم‌مرکز

**concentricity** /'kɑ:nsen'trɪsəti/ *noun*

هاوناوەندی، هاوچەقی، یەک‌ناوەندێتی ◌ هم‌مرکزی

**concept** /'kɒnsept, US 'kɑ:n-/ *noun*

چەمک، بیر، هزر، بیرۆکە، بیرۆکەی گشتی ◌ مفهوم، اندیشه، اندیشه‌ی کلی

**concept formation** *noun*

پێکهاتنی یان دروست‌بوونی چەمک یان بیر، گۆورانی چەمک ◌ تشکیل مفهوم

**conception** /kən'sepʃn/ *noun*

1 هێنانەبەرچاو، وێنا 2 چەمک، بیر، هزر 3 پلان 4 بۆچوون، را، دیتن 5 دووگیانی، سکپڕی، ئاوڵەمە، کۆرپەڵە: *the moment of conception* 6 تێگەیشتن، پێ‌بردن، پێزانین، سەرەندەرکردن ◌ 1 تصور 2 مفهوم، اندیشه 3 طرح 4 برداشت 5 حمل، جنین 6 فهم، ادارک

**conceptual** /kən'septʃuəl/ *adjective*

1 بیرۆکەیی، هزری، بیری 2 پێکهاتوو لە چەمکەکان، چەمکی، کۆچەمکی، سەربە چەمکەکان، لەسەربنچینەی چەمکەکان 3 عەقڵانی، ژیرانی، ئاوەزی ◌ 1 فکری 2 وابسته به مفاهیم یا برپایه‌ی مفاهیم 3 عقلانی، تعقلی

**conceptual apparatus** *noun*

دەزگای چەمکی ◌ دستگاه مفهومی

**conceptual art** *noun*

هونەری چەمکی یان ئەقڵانی (= زیاتر سەرنج دەداتە چەمک و کانسێپتەکان تا راستی شتەکان؛ conceptual artist *n*) ◌ هنر عقلانی

**conceptualism** /kən'septʃuəlɪzəm/ *noun*

1 چـەمک‌بـاوەری 2 (زۆرتـر بـە C) = conceptual art (conceptualistic *adj*؛ conceptualistically *adv*) ◌ مفهوم‌گرایی

**conceptualist** /kən'septʃuəlɪst/ *noun*

چەمک‌باوەڕ ◌ مفهوم‌گرا

**conceptualization** *noun*

هێنانەبەرچاو، وێناکردن، چەمک(دا)ڕێـژی، داڕشتنی چەمک، عەقڵانی‌کردن ◌ تجسم، مفهوم‌سازی، عقلانی‌سازی

**conceptually** /kən'septʃuəli/ *adverb*

لەباری عەقڵانی‌یەوە: *conceptually similar* ◌ از لحاظ عقلانی

**conceptus** /kən'sɛptəs/ *noun*

ئاوەڵمە یان ئاوڵەمەیێ بەدرێژایی قۆناخە سەرەتاکانی زگپڕی ◌ کانسپتوس

**concern** /kən'sɜ:n, US -'sɜ:rn/ *noun*

1 بابەتی پێخۆش‌بوو، باسی بابەتی (دڵ)، بابەت یان پرسی جێی سەرنج 2 هۆگری، دڵبەستەیی 3 دەخـڵ، پێوەندی، بەر 4 سەرنج، ئاگاداری، ئاگالێ‌بوون، چاوبەسەرەوەبوون 5 نیگەرانی، دڵەراوکێ، دڵلەدوایی، نارەحەتی، مایەی نگەرانی 6 کار و کاسپی، کار، ئەرک، پەیوور 7 بەرپرسایەتی 8 کۆمپانیا، نێوکۆیی 9 دامەزراوە کارداری یان پیشەسازی 10 بەش، پشک ◌ 1 موضوع مورد علاقه 2 علاقه 3 ربط 4 توجه، مراقبت 5 دلواپسی، موجب نگرانی 6 کسب و کار، وظیفه، شغل 7 مسؤلیت 8 شرکت 9 مؤسسه‌ی تجاری یا صنعتی 10 سهم

**concerned** /kən'sɜ:nd, US -'sɜ:rnd/ *adjective*

1 نیگەران، دڵلەدوا، نارەحەت: *-rned for their safety* 2 پێوەبوو، هۆگر، دڵبەستە 3 لەبارەی، لەمەڕ ◌ 1 دلواپس 2 علاقمند 3 راجع به

**concernedly** /kən'sɜ:nɪdli, US -'sɜ:rnɪdli/ *adverb*

بە نگەرانی‌یەوە ◌ با نگرانی

**concerning** /kən'sɜ:nɪŋ, US -'sɜ:rn-/ *preposition*

(فەرمی) لەبارەی، لەمەڕ، دەربارەی، لەبابەت، لەباوەت: *All cases concerning children are dealt with in a special children's court* ◌ دربارەی، در خصوص

**concernment** *noun*

1 پێوەندی، دەخـڵ 2 نگەرانی، دڵلەدوایی، نارەحەتی، دڵەراوکێ 3 گرنگی 4 کار ◌ 1 ربط 2 دلواپسی 3 اهمیت 4 امر

**concert** /'kɒnsət, US 'kɑ:nsərt/ *noun*

1 کۆنسێرت، ئاهەنگ: *a classical/rock/pop*

2 *a concert of music by Bach* ◊ *concert* ریک‌کەوتن، پێکهاتن، سازان، گونجان، کۆکی، هاوکۆکی 3 (بێ‌باو) – concord ۞ 1 کنسرت 2 هماهنگی، توافق، اتفاق

**concerted** /kən'sɜːtɪd, US -'sɜːrt-/ *adjective*
هاوبەش، پێکەوە، بەکۆمەڵ، لەگەڵ‌یەک: *a* ◊ *a concerted approach* ◊ *concerted effort* (concertedness *n*) ۞ مشترک، جمعی

**concertedly** /kən'sɜːtɪdli, US -'sɜːrt-/ *adverb*
پێکەوە، لەگەڵ‌یەک ۞ مشترکاً

**concert-goer** /'kɒnsətgəʊə(r), US 'kɑːnsətgəʊər/ *noun*, also -rtgoer
کۆنسێرت‌ڕەو، فێرەکۆنسێرت ۞ کنسرت‌رو

**concert grand** *noun*
پیانۆی رووپال، گەورەپیانۆ (بۆ هۆڵی کۆنسێرت) ۞ پیانوی بزرگ

**concert hall** *noun*
هۆڵ یان هاڵی کۆنسێرت ۞ سالن کونسرت

**concertina** /ˌkɒnsə'tiːnə, US ˌkɑːnsər't-/ *noun*
کانسێرتینا (= ئامێرێکی موسیقایە، لە خێزانی ئاکاردیۆن) ۞ کونسرتینا

**concertino** /ˌkɒntʃə'tiːnəʊ/ *noun, pl.* -inos
1 کانسێرتینۆ 2 کۆنسێرتۆی سادە یان کورت ۞ کنسرتینو

**concertmaster** /'kɒnsətmɑːstə(r), US 'kɑːnsərtmæs-/ *noun*, also concertmeister
ڤیۆلۆنژەنی سەرەتا، سەرژەن، سەرموسیقاژەن ۞ ویولونیست نخست

**concerto** /kən'tʃɜːtəʊ, US -'tʃɜːrtoʊ/ *noun, pl.* concertos or concerti
کۆنسێرتۆ: *a* ◊ *a concerto for flute and harp* ◊ *piano concerto* ۞ کنسرتو

**concert pitch** *noun*
1 (هەرووەها international pitch، موسیقا) میزان یان کۆکی پێوانە یان ستاندارد، کانسێرت پیچ (بە لەرەی 440 هێرتزەوە) 2 (at concert pitch) سازی ساز، ئامادەی ئامادە، تەواوئامادە ۞ 1 کوک معیار 2 آمادەی آمادە

**concession** /kən'seʃn/ *noun*
1 پێدان، بەدەستەوەدان، سپاردن 2 ئیمتیاز، تایبەت‌ماف 3 پەسندکردن، قەبووڵ(کردن)، خۆبەدەستەوەدان، ملنان 4 سازان، گونجان، ڕیک‌کەوتن 5 (لێ)داشکاندن، کەم‌کردنەوە، مایەدانان، لێدەرکردن، لێ‌فڕێدان 6 ئیمتیاز یان مافی بەکارهێنان (concessional *adj*) ۞ 1 اعطا 2 امتیاز 3 قبول، تسلیم 4 تخفیف 5 سازش، توافق 6 امتیاز یا حق بهره‌برداری

**concessionaire** /kənˌseʃə'neə(r), US -'ner/ *noun*, also -cessionnaire
خاوەن‌تایبەت‌ماف، خاوەن ئیمتیاز (بەکارهێنانی زەوی یان بازرگانی) ۞ دارندەی امتیاز

**concessionary** /kən'seʃənəri, -neri/ *adjective*
بە مایە(دانانە)وە، بە لێ‌دەرکردنەوە، بە لێ‌داشکاندن، بە لێ‌دەرکردنەوە: *-cessionary* ۞ *rates/fares/trave* با تخفیف

**concessioner** *noun*
خاوەن‌تایبەماف، خاوەن ئیمتیاز ۞ صاحب امتیاز

**concessive** /kən'sesɪv/ *adjective*
(ڕێزمان) دان‌پیانەرانە، سەلمێنەرانە (ئەمانەش وشەکانین even though ،while ،in spite of ،although (وەک ;although I am old, I am not stupid) (concessively *adv*) ۞ تصدیقی، پذیرشی

**conch** /kɒntʃ, US kɑːntʃ/ *noun, pl.* conchs /kɒŋks/ or conches /'kɒntʃɪz/
1 (گیانەوەرناسی) لەپکەی شەیتانۆکە، کوێچکەماسی، شەیتانۆکە [*Strombus* و توخمەکانی تر، زۆر جۆرن] 2 قوڵکە یان چاڵی نەرمەی گوێ 3 (بیناسازی) گومەز یان میچی نیوەخڕ، نیوەگومەز، لاگومەز ۞ 1 صدف حلزونی 2 گودی لالەی گوش 3 گنبد نیم‌گرد

**conch(o)-** *prefix*
پێشگر: لەپکە (بنەڕەت: لە *concha* لاتین "shellfish, shell"، لە *konkhē* یۆنانی "mussel, cockle" یان بۆشایی‌ێکی لەپکەئاسا) ۞ پیشوند: صدف

**concha** /'kɒŋkə/ *noun, pl.* conchae /-kiː/
1 قوڵکە یان چاڵی نەرمەی گوێ 2 (بیناسازی) گومەز یان میچی نیوەخڕ، نیوەگومەز، لاگومەز ۞ 1 گودی لالەی گوش 2 گنبد نیم‌گرد

**conchal** *noun*
سەربە کۆنچا ۞ وابستە بە کونچا

**conchiferous** /'kɑːŋ'kɪfərəs/ *adjective*
لەپکەلان ۞ صدف‌خیز

**conchiolin** *noun*, also conchin
لەپکینە: جۆرێ پرۆتینی ریشاڵی سەخت کە توێکڵی یان قاپێلکی (لەپکەی) لەش‌نەرمان پێکدێنێ (وەک mother-of-pearl) ۞ کونکیولین

**conchoidal** /kɒŋ'kɔɪd(ə)l/ *adjective*
لەپکەیی، شێوەلەپکە ۞ صدف‌وار

**conchological** /kɒ'kɒledʒɪkl/ *adjective*
لەپکەناسی‌یانە، سەربە لەپکەناسی یان سەدەفناسی ۞ صدف‌شناختی

**conchologist** *noun*
لەپکەناس، سەدەفناس ۞ صدف‌شناس

**conchology** /kɒŋ'kɒlədʒi/ *noun*
لەپکەناسی، سەدەفناسی ۞ صدف‌شناسی

**concierge** /'kɒnsieəʒ, US kɔːn'sjerʒ/ *noun*
1 دەرگاوان، دەرکەوان، دالان‌دار 2 پەردەدار ۞

1 سرایدار 2 حاجب

**conciliar** /kən'sɪlɪə/ *adjective*

ئەنجومەنی، سەربە ئەنجومەن، دەرکراو یان دەرچوو لە ئەنجومەن (conciliarly *adv*) ۞ وابستە بە شورا، صادرە از مجلس

**conciliation** /kən,sɪli'eɪʃn/ *noun*

1 دلدانەوە، دلخوشیدانەوە، دەلالەت، دلنەوایی، ژیرکردنەوە، ڕقڕەوینی، نەرمکردن، دلڕاگرتن 2 ئاشتکردنەوە، ڕێکخستنەوە، پێکهێنانەوە، یەکخستنەوە، ڕێککەوتن 3 گونجاندن، لواندن، ڕێکخستن 4 نێوبژایەتی، کێشەڕەوینی ۞ 1 استمالت، دلجویی، تسلی 2 مصالحە، توافق 3 وفق دادن 4 میانجی‌گری

**conciliative** *adjective*

دلدانەوەیی، دلخوشیدەرەوانە، خەمڕەوینانە ۞ دلجویی‌آمیز

**conciliator** /kən'sɪlieɪtə(r)/ *noun*

دلخوشیدەرەوە، دلدەرەوە ۞ دلجویی‌کنندە

**conciliatory** /kən'sɪliətəri, US -tɔ:ri/ *adjective*

ئاشتیخوازانە، دۆستانە، دلدەرەوانە: *a conciliatory attitude/gesture/move* ◊ *a conciliatory approach* ۞ مسالمت‌آمیز، دلجویی‌آمیز

**concinnity** /kən'sɪnɪti/ *noun*

(دەگمەن) ناسکی، جوانی، گونجاوی ۞ ظرافت، تناسب

**concise** /kən'saɪs/ *adjective*

کورتە، پوختە، تەنیا ئەو زانیارییە بە دەستەوە دەدا کە پێویست و گرنگە، پڕ لە زانیاری کورت و روون: *a concise definition* ◊ *a concise summary*؛ (کتێبێ) کورتتر لە کتێبە بنەماکەی: *a concise dictionary* ۞ موجز، فشردە

**concisely** /kən'saɪsli/ *adverb*

بە کورتی، پوخت: *He spoke clearly and concisely* ۞ اجمالاً

**conciseness** /kən'saɪsnəs/ *noun*, also (less frequent) -ision /kən'sɪʒn/

کورتی، پوختی ۞ اختصار، ایجاز

**conclave** /'kɒŋkleɪv, US 'kɑ:ŋ-/ *noun*

کۆبوونەوەی نەهێنی، کۆبوونەوەی تایبەتی، ئەنجومەنی هەلبژاردن (ب.ت. کاردیناڵەکان بۆ هەلبژاردنی پاپ) ۞ جلسەی محرمانە

**concluding** *adjective*

دوایین ۞ آخرین

**conclusion** /kən'klu:ʒn/ *noun*

1 کۆتایی، دوایی، ئاخر، دووماهی 2 ئەنجام، ئاکام، result، outcome 3 ئەنجامگیری، بۆدەرکەوتن 4 بڕیار (دوایی) 5 بەستن، گرێدان، بڕینەوە، گرێبەست ۞ 1 پایان 2 نتیجە، برآیند 3 استنتاج 4 تصمیم 5 انعقاد

**conclusive** /kən'klu:sɪv/ *adjective*

بڕینەرەوە، یەکلاییکەرەوە، دواییپێهێن، دواییپێهێنەر، decisive، determinative: *conclusive evidence/proof/results* ۞ قطعی

**conclusively** /kən'klu:sɪvli/ *adverb*

یەکلاییکەرەوانە، بەشێوەیەکی بڕینەرەوە یان یەکلاییکەرەوە: *to prove something conclusively* ۞ بە طور قطعی

**conclusiveness** /kən'klu:sɪvnəs/ *noun*

یەکلاییکەرەوەیی، بڕینەرەوەیی، کۆتاییپێهێنی ۞ قطعیت

**concoction** /kən'kɒkʃn, US -'kɑ:kʃn/ *noun*

1 تێکەلە، چێشتی مجێور 2 تێکەلکردن، پێکەوەنان، لێکدان، گرتنەوە، دروستکردن، هەلبەستن، ڕێکخستن، داهێنان 3 ئامادەکاری، گەلالەکاری ۞ 1 معجون 2 ترکیب، ساخت، اختراع 3 تمهید

**concoctor** *noun*

دروسکەر، تێکەلکەر، لێکدەر ۞ ترکیب‌کنندە

**concomitance** /kən'kɒmɪt(ə)ns/ *noun*, also concomitancy

1 لەگەلیەکبوون، پێکەوەیی، پێکەوەبوون، تەفرایی 2 پێکوەیی، باوەڕێ کە لەش و خوێنی مەسیح لە نان و مەی شێوی خواوەندیدا هەیە ۞ 1 ملازمت 2 کونکومیتانس

**concomitant** /kən'kɒmɪtənt, US -'kɑ:m-/ *adjective, noun*

لەگەل، پێکەوە، هاوڕێ، پێکەوەهاتوو، پاشکۆ، لەگەلخستە: *an increase in student numbers and the concomitant increase in class size* ۞ همراه، ملازم، ضمیمە

**concord** /'kɒŋkɔ:d, US 'kɑ:ŋkɔ:rd/ *noun*

1 ڕێککەوتن، پێکهاتن، سازان، یەککەوتن، گونجان، کۆکی، تەبایی، ئاشتی، harmony (دژەکەی discord): *living in concord with neighbouring states* 2 پەیماننامە 3 (ڕێزمان) یەکگرتنەوە، یەکگیری، یەکانگیری، هاوگیری، agreement: *In the sentence 'They live in the country.', the plural verb 'live' is in concord with the plural subject 'They'* ۞ 1 توافق، هماهنگی، سازش 2 معاهدە 3 مطابقە (دستور زبان)

**concordance** /kən'kɔ:dəns, US -'kɔ:rd-/ *noun*

1 لیستەی ئەلفوبێیی (وشە گرنگەکانی نێو دەقێک)، پێرست 2 ڕێککەوتن، یەککەوتن، هاوکۆکی، هاوبیری، گونجان، کۆکێتی، concord 3 لێکچوون، هاوشێوەیی، agreement ۞ 1 کشف‌اللغات 2 تطابق، هماهنگی، مطابقت 3 تشابە

**concordant** /kən'kɔ:dənt, US -'kɔ:rd-/ *adjective*

ڕیک کەوتوو (لەگەڵ)، گونجاو، کۆک، ساز ◌ هماهنگ، متوافق، مطابق (با)

**concordat** /kən'kɔːdæt, US -'kɔːrd-, BrE also kɒn-/ *noun*

پەیمان‌نامە، ڕیک‌کەوتن‌نامە (ب.ت. نێوان کلێسەی کاتۆلیکی ڕۆمانی و وڵاتێ) ◌ قرارداد، توافق‌نامه

**concours** /'kõkʊə/ *noun*, also concours d'élégance /ˌdɛleɪ'gõs/

پێشبڕکێ (بنەڕەت: فەرەنسی " contest (of elegance") ◌ مسابقه

**concourse** /'kɒŋkɔːs, US 'kɑːŋkɔːrs/ *noun*

1 کۆمەڵگا، جەقین، کۆبوونەوە، تێمرووکان، کۆمەڵکەکردن، کۆمەڵبەستن، پەوورەدان، تەمورکەدان، کۆمبین، کۆمەڵە، جەماوەر، کۆمەڵ 2 مەکۆ، ساڵۆن، جێگای کۆبوونەوە، شوێن، کۆمگە: *the station concourse* 3 هاوکاتی ◌ 1 اجتماع، تجمع، جمعیت 2 سالن 3 تقارن

**concrescence** /kən'krɛs(ə)ns/ *noun*

گەشە، هەڵدان، پێکەوەهەڵدان، پێکەوەگەورەبوون، هاوگەشەیی، پێکەوەشینبوون ◌ رشد، رشد با همدیگر

**concrescent** /kən'krɛsənt/ *adjective*

پێکەوەهەڵداو، پێکەوەگەورەبوو، هاوگەشە، پێکەوەشینبوو ◌ رشدکننده با همدیگر

**concrete** /'kɒŋkriːt, US 'kɑːŋ-/ *adjectivem noun*

1 *adj* دروستکراو لە کۆنکریت یان شفتە و بێتۆن: *a concrete wall* ◊ *a concrete floor* 2 بابەتی، بەردەس‌کەوتوو، هەست‌پێکراو، بەرهەست، لەسەر بنەمای فاکت، ڕاست(ەقینە)، ناخەیاڵی، نائابستراکت، دەس‌لێدراو، مادی، ماکی، مەتریاڵی: *concrete proposals/proof* ◊ 2 دیار، تایبەتی، پۆزیتیف، *concrete evidence* بەرجەستە، بەرچاو، particular ،specific :*a* 3 (ڕێزمان) زات، بابەت؟ 4 *concrete proposal* ڕەق *n* شفتە، شەفتە، بێتۆن، کۆنکریت: *a slab of concrete* (concreteness *n*) ◌ 1 *adj* بتونی 2 عینی، ملموس، غیرخیالی، واقعی، مادی 2 مشخص، خاص 3 (دستور زبان) ذات 4 سفت *n* بتون

**concrete jungle** *noun*

دارستانی کۆنکریت ◌ جنگل بتونی

**concrete mixer** = cement mixer

**concretely** /'kɒŋkriːtli, US 'kɑːŋ-/ *adverb*

بابەتییانە، بە شێوەیەکی بابەتی یان بەرهەست، بەرهەستانە ◌ به طور عینی یان ملموسی

**concrete music** *noun*, also musique concrète

موسیقای کۆنکریت یا تێک‌هەڵکێشراو؟، موسیقای بابەتی ◌ موسیقی انضمامی، موسیقی عینی

**concrete noun** *noun*

(ڕێزمان) ناوی زات یان بابەت (وەک ماشین، ماڵ و...) ◌ اسم زات

**concrete number** *noun*

ژمارەی بابەتی یان کۆنکریت (ژمارەیێ کە پێوەندی هەیە بە شت یان بابەتێکی تایبەتییەوە) ◌ عدد انضمامی

**concrete poetry** *noun*

هەڵبەست یان هۆنەی تێهەڵکێشراو؟، هۆنراوەی بابەتی ◌ شعر انضمامی، شعر عینی

**concretion** /kən'kriːʃn/ *noun*

1 ڕەقبوون، توندبوون، سەخت‌بوون، بەبەردبوون، بوونەبەرد؛ coalescence، solidification 2 شتێکی ڕەق(بوو) لە نێو لەش‌دا، بەهۆی نەخۆشییەوە پەیدا بووە (وەک tophus و bezoar) 3 بەردەڵ: تۆپەڵەیێکی خڕ لە ماک و مەتریاڵی کانی کە لە بەردەڵم، گڵەسوورە و هتد هەیە و لە دەوری ناوکەیەک nucleus بە شێوەی توێ و چینی هاوناوەند concentric پێکهاتووە (concretionary *adj*) ◌ 1 تحجر، سفت‌شدگی 2 کونکرسیون 3 سنگال

**concretional** *adjective*

سەربە ڕەقبوون ◌ وابسته به سفت‌شدگی

**concretive** /kɒn'kriːtɪv/ *adjective*

ڕەقەوەبوو، سەختەوەبوو، مایەی ڕەقبوون، توندەوەبوو ◌ سفت‌شونده

**concretization** *noun*

کۆنکریتاندن، بابەتاندن، بابەتی‌کردن، کردنەبەرهەست، بەرهەستاندن ◌ ملموس‌سازی

**concubinage** /kɒn'kjuːbɪnɪdʒ/ *noun*

ڕەوشی سووکەمارەیێتی، ژیواری سووکەمارەیی، بردنەسەری ژیان بەو شێوازە ◌ وضع صیغه‌ای یا زندگانی مُتعگی

**concubine** /'kɒŋkjubaɪn, US 'kɑːŋ-/ *noun*

1 ژنی سووکەمارەیی، سووکەمارەیی‌لەسەر، جاریە، زەماوەندی کاتی، هاوسەرێنی بێ‌زەماوەند 2 mistress (concubinary /kən'kjuːbɪn(ə)ri/ *adj*) ◌ زن صیغه‌ای، مُتعه

**concupiscence** /kən'kjuːpɪsns/ *noun*

ئارەزووی سێکسی (بەهێز)، ئاڵۆش، کەڵبە، sexual desire ◌ شهوت

**concupiscent** /kən'kjuːpɪsənt/ *adjective*

بەئاڵۆش، ئاڵۆشاوی، حەشەری، کەڵبەکردوو، شەهوانی، lust ◌ شهوانی

**concurrence** /kən'kʌrəns, US -'kɜːr-/ *noun*

1 ڕیک‌کەوتن، سازبوون، پێک‌هاتن 2 هاوکاتی: *an unfortunate concurrence of events* 3 (بیرکاری) پێک‌گەیشتن، گەیینەوە 4 خاڵی پێک‌گەیشتن، جەمسەر ◌ 1 موافقت، توافق 2 تقارن 3 تلاقی 4 نقطه‌ی تلاقی

**concurrent** /kən'kʌrənt, US -'kɜːr-/ *adjective*

1 هاوکات، لەیەکوەختا 2 ڕێککەوتو، ساز، هاوبیر، پێکهاتوو: *3 concurrent jurisdiction* (بیرکاری) پێک‌گەیشتوو، جەمسەر، پێک‌گەیو، گەیو ۞ 1 همزمان، مقارن 2 موافق 3 متقاطع
**concurrently** /kən'kʌrəntli, US -'kɜːr-/ *adverb*
هاوکاتانە، لە یەک کاتا ۞ به طور همزمان
**concussion** /kən'kʌʃn/ *noun*
1 زەربەی سەر، بریندار بوونی سەر یان مێشک، مێشک‌شلەقان، لێدرانی مێشک یا سەر 2 تەکانی توند، ڕاتلەکانی سەخت، ڕاوەشانی توندوتیژ ۞ 1 ضربه یا آسیب مغزی 2 تصادم، تکان
**condemnable** *adjective*
شیاوی ناپەسندکردن یان مەحکوومکردن ۞ محکوم‌کردنی
**condemnation** /ˌkɒndem'neɪʃn, US ˌkɑːn-/ *noun*
1 مەحکوومیەت 2 شەرمەزارکردن، بەگژداهاتن، ناپەسندکردن، مەحکوومکردن، ئیدانەکردن، تاوانبارکردن، گوناهبارکردن: *There was widespread condemnation of the invasion* 3 بەسەرداهاتن، سەرکۆنە 4 دەربڕینی بێزاری 5 هەڵە، چەوتی 6 دەس‌بەسەراگرتن، گرتن (بۆ بەرژەوەندی گشتی) ۞ 1 محکومیت 2 عمل محکوم کردن 3 سرزنش 4 ابراز بیزاری 5 اشتباه 6 مصادره
**condemnatory** *adjective*
شەرمەزاری‌یانە، ناپەسندکەرانە، مەحکوومی‌یانە ۞ محکومیت‌آمیز
**condemned** *adjective*
مەحکوومکراو، ناپەسندکراو، سزا(مەرگ)لەسەر، بە گوناهبارناسراو، بە تاوانبارناسراو ۞ محکوم
**condemned cell** *noun*
ژووری زیندانیانی بڕیاری لە سێدارەدراو، ژوور یان سلولی مەحکوومان ۞ سلول اعدامیان
**condemner** *noun*
بەگژداهاتوو، محکوومکەر، ناپەسندکەر ۞ محکوم‌کننده
**condensability** /kənˌdensə'bɪləti/ *noun*
لەچڕکردنەوەهاتوویی ۞ تکثیف‌پذیری
**condensable** /kən'densə'bɪləti/ *adjective*, also condensible
لەچڕکردنەوەهاتوو ۞ تکثیف‌پذیر
**condensation** /ˌkɒnden'seɪʃn, US ˌkɑːn-/ *noun*
1 چڕی، چڕبوونەوە 2 شتی چڕەوەبوو 3 تۆڵا، شلان (= پرۆسەی گۆڕینی گاز (یان هەڵم) بۆ شلە)، چڕکردنەوە، چڕاندن 4 خەستکردنەوە، خەستاندن 5 کورتکردنەوە، کورتەنووسی، کورتە، پوختە 6 نارەق 7 هەڵم (condensational *adj*) ۞ 1 تراکم 2 شیء متراکم 3 چگالش، میعان، تکثیف 4 تغلیظ 5 تلخیص، اختصار 6 عرق 7 بخار
**condensed** *adjective*
کورتە، خەست، چڕ ۞ ملخص، غلیظ
**condensed milk** *noun*
شیری خەست (بە هەڵماندن و پێوەکردنی شەکر) ۞ شیر غلیظ
**condenser** /kən'densə(r)/ *noun*
1 کۆندێنسێر، بارگەگر، چڕەکێ، چڕگەر؟ 2 لێنز یان ئاوێنەیێ بۆ چڕکردنەوەی یا کۆکردنەوەی تیشک لەسەر شتێ بەکاردێتێ 3 دەزگایێ بۆ چڕکردنەوەی گاز و هەڵم، چڕەک ۞ 1 خازن، چگالنده 2 و 3 کاندنسر
**condescending** /ˌkɒndɪn'sendɪŋ/ *adjective*
فەخرفرۆش، لووت‌بەرز، لەخۆرازی، لەخۆبایی، بەعینوان، بەمنەت، بەترووتوپ، patronizing: *He has a condescending attitude towards women* ۞ فخرفروش، افاده‌ای
**condescendingly** /ˌkɒndɪn'sendɪŋli/ *adverb*
لووت‌بەرزانە، بەمنەتەوە، بەترووتوپەوە، فەخرفرۆشانە ۞ با افاده
**condescension** /ˌkɒndɪ'senʃn, US ˌkɑːn-/ *noun*
ئیفادە، منەت، ترووتوپ، فیزنی، دەمار، فەخرفرۆشی ۞ افاده، فخرفروشی
**condign** /kən'daɪn/ *adjective*
بەرحەق، بەجێ، شیاو، ڕەوا، deserved، *condign punishment* :appropriate (condignly *adv*) ۞ مستحق، درخور
**condiment** /'kɒndɪmənt, US 'kɑːn-/ *noun*
بەهارات، ئالەت و زەردەچێوە، هەزوێلە، دەرمانک ۞ چاشنی، ادویه
**condition** /kən'dɪʃn/ *noun*
1 مەرج، شەرت؛ مەرجی پێویست، prerequisite 2 ڕەوش، لۆر، بار، دۆخ، کاودان، بارودۆخ، هەڵومەرج، مەرەد، چۆنیەتی: *to be in bad/good condition* 3 لەش‌ساغی، سلامەتی، ساغی 4 نەخۆشی، ناسازی 5 (کۆمەلایەتی) پلەوپایە، پێگە 6 (conditions) هەڵومەرج، بارودۆخ، کاودان، دەستوەدار ۞ 1 شرط؛ شرط لازم 2 وضع، چگونگی، حالت 3 سلامت 4 بیماری 5 منزلت 6 (در جمع) شرایط، اوضاع
**conditional** /kən'dɪʃənl/ *adjective, noun*
*adj* 1 مەرجی، مەرجەکی، مەرج‌دار، بەرمەرج، بەشەرت، پێبەند، بەند: *conditional* *a conitional* ◊ *approval/acceptance* 2 ناڕوون، نادیار، نامەعلووم *promise* 3 (ڕێزمان) مەرجی، مەرج‌دەربڕ، گەرینی، گومانداری، هەکانی: *a conitional sentence/clause* *n* ڕستە یان دەستەوشەی مەرجی، قالبی مەرجی یان مەرج‌دەربڕ ۞ *adj*

1 مشروط، مقید 2 نامعلوم 3 (دستور زبان) شـرطی *n* جمله یا عبارت شرطی

**conditionality** /kən,dɪʃə'nælətɪ/ *noun*

مـەرجداری، بەنـدبوون بـە شـتێ، بەنـدێتی، بەرمەرجی، مەرجیبوون ۞ مشروط بودن

**conditionally** /-ʃənəli/ *adverb*

بە مەرجێ، بەو شەرتە، بە شەرتێ ۞ بە شرط

**conditioned** *adjective*

فێربوو، خووگرتوو، مەرجی، بەرمـەرج، بەنـد ۞ شرطی، مشروط

**conditioned reflex** *noun*

پەرچەکردار یان کاردانەوەی مەرجی یان فێربوو ۞ بازتاب شرطی

**conditioner** /kən'dɪʃənə(r)/ *noun*

نـەرمکـەر (قـژ و...): *shampoo and conditioner* ۞ نرمکننده

**conditioning** /kən'dɪʃənɪŋ/ *noun*

1 راهێنـــان، فێرکـــردن 2 (دەروونناســـی) مەرجیکردن، فێرکردن، مەرجاندن 3 گونجاندن، سـازاندن، دەقپێدان، دەقاندن، لواندن ۞ 1 تربیت 2 شـرطیسازی 3 وفق دادن، تطبیق

**condo** /'kɒndəʊ, US 'kɑːndoʊ/ = condominium

**condolence** /kən'dəʊləns, US -'doʊ-/ *noun*, also condolement

1 دلـدانەوە، دلـنەوایـی، دلخۆشـیدانـەوە، هاوسۆزی، خەمخۆری: *Our condolences go to his wife and family* 2 سەرەخۆشـی، پرسـە: *a letter of condolence* (زۆرتر لە کۆدا condolences) ۞ 1 همدردی 2 تسلیت

**condom** /'kɒndɒm, US 'kɑːndəm/ *noun*, (also US prophylactic)

جیر، کاندۆم ۞ کاندوم

**condominium** /,kɒndə'mɪniəm, US ,kɑːn-/ *noun*,

1 کۆمەلـــە دەســـتەخانووێ 2 ئاپارتمـــان، دەســـتەخانوو 3 هاوخاوەنـداری، خاوەنـداری هاوبەشـێتی 4 بـڕیاری هاوبـەش 5 سـەروەری هاوبەش (لە بەڕێوەبردنی دوو یان چەند ولات) 6 دەسەلاتی هاوبەش ۞ 1 مجموعەی آپاتمانی 2 آپارتمان 3 مالکیـت اشـتراکی 4 حکـم مـشترک 5 سیادت مشترک 6 تـسلط مشترک

**condonation** /,kɒndəʊ'neɪʃn/ *noun*

لێـبوردن، لێخـۆشبـوون، چاوپۆشـی، داکروپـان، لەبەرچاونەگرتن ۞ اغماض، بخشش

**condor** /'kɒndɔː(r), US 'kɑːn-/ *noun*

(گیانەوەرناسی) سیـــارگی ئەمریکایی [ *Vultur gryphus* (هـی ئانـدی Andean، ئـەمریکـای باشـووری) و *Gymnogyps californianus* (هـی کالیفۆرنیـا، مـەترسـی قڕبوونی لەسـەرە)] (بنـەڕەت: لـە *condor* سـپانیایی، لـە *kuntur* کێچوایی‌دا Quechua) ۞ کندور

**condottiere** /,kɒndɒ'tjɛːreɪ, US -rɪ/ *noun*, *pl.* condottieri

(مێژوویی، لە ئیتالیا) ڕێبەر یان ئەندامی سـەربازە بـەکرێگیراوەکـان (بنـەڕەت: ئیتالیـایی، لـە *condotto* "سەربازی گرێبەستی") ۞ کندوتیری

**conducive** /kən'djuːsɪv, US -'duːs-/ *adjective*

1 لێوەکەوتوو، بووەهۆی، مایە، سەرچاوە، زێدەر: 2 *an atmosphere conducive to education* گونجاو ۞ 1 منجرشونده، موجب، منشأ 2 مناسب

**conduct** /'kɒndʌkt, US 'kɑːn-/ *noun*

1 رەفتار، هەلـسوکەوت، ئاکار و کردار، ئاکار، رەوشـت: *The sport has a strict code of conduct* 2 بـــەڕێوەبردن، هەلـــسووڕاندن، جێبەجێکردن، ڕێبەرایەتی، بەڕێدابردن، گێڕان ۞ 1 رفتار، اخلاق، سلوک 2 اداره، هدایت

**conductance** /kən'dʌktəns/ *noun*

(کارەبا) گەیاندن ۞ هدایت

**conductibility** /kən,dʌktə'bɪlətɪ/ *noun*

لەگەیاندنهاتوویی ۞ قابلیت هدایت

**conductible** /kən'dʌktɪbl/ *adjective*

لەگەیاندنهاتوو، لە گەیاندن دێ ۞ قابل هدایت

**conducted tour** *noun*

گەڕان لەگەل ڕێنیـشاندەر یان بـەڕێدابـەر ۞ گشت با راهنما

**conduction** /kən'dʌkʃn/ *noun*

گەیاندن، گواستنەوە، بردن، کێشان، ڕاکێشـان ۞ رسانایی، هدایت

**conductive** /kən'dʌktɪv/ *adjective*

گەێنەر، گەیەنەر، گەێن، خاوەنی گەێنـەری ۞ هادی، رسانا

**conductivity** /,kɒndʌk'tɪvəti, US ,kɑːn-/ *noun*

گەێنەری، گەێنێتی ۞ رسانایی

**conductometric** *adjective*

سەربە گەیاندنپێوی، گەیاندنپێوییانە ۞ وابسته به رسانایی‌سنجی

**conductometry** *noun*

گەیاندنپێوی ۞ رسانایی‌سنجی

**conductor** /kən'dʌktə(r)/ *noun*

1 بەڕێوەبـەر، کارگێـر، هەلـسووڕێنەر 2 ڕێبـەر، سـەرتیپی ئۆرکێسترا 3 گەێنـەر: *Wood is a poor conductor* 4 شاگردشـۆفێر، شـۆفێریار، بلیـتچـی، بلیـتکۆکـەرەوە 5 سـەرۆک یـان بەرپرسی شەمەندەفەر ۞ 1 مدیر 2 رهبر (ارکستر) 3 رسانا 4 کمک‌راننده 5 رئیس یا مسؤل قطار

**conductor rail** *noun*

رەیل یا ڕێیلی کارەبا (شەمەندەفەر) ۞ ریل برق

**conductorship** /kən'dʌktəʃɪp/ *noun*

بەڕێوەبەری، کارگێڕی ۞ مدیریت

**conductress** /kən'dʌktrəs/ *noun, fem.* conductor
شاگردشۆفیر، دواشۆفیر، بلیتچی (ژن) ۞ کمک‌راننده

**conduit** /'kɒndjuɪt, US 'kɑːnduɪt/ *noun*
رەهەنداو، نۆکەند، بۆری، لوولە، ئاوەڕۆ، جۆگە ۞ مجرا، کانال

**conduplicate** *adjective*
(لەباری درێژایی‌یەوە) دانووشتاو، دووقەد، داچەماو ۞ دولاشده

**condylarth** /'kɒndɪlɑːθ/ *noun*
(کۆنینەناسی) بووبەردی گیانەوەرێکی گیاخۆر ۞ کوندیلارت

**condylar** *adjective*
(توێکاری) خرتکەیی، سەربە خرتکە ۞ وابسته به کوندیل

**condyle** /'kɒndɪl, US -dʌɪl/ *noun*
(توێکاری) خرتکە (بنەڕەت: لە *kondulos* یۆنانی‌یەوە "knuckle") ۞ کوندیل

**condyloid** *adjective*
خرتکەئاسا، شێوەخرتکە ۞ کوندیل‌مانند

**condyloma** /ˌkɒndɪ'ləʊmə/ *noun, pl.* condylomas or condylomata /-mətə/, also genital wart
بالووکەی کۆم (= بە هۆی ڤایرۆس یان فەرەنگی‌یەوە syphilis تووش دەبێ، بنەڕەت: لە *kondulos* یۆنانی "knuckle") ۞ زگیل مقعد

**condylomatous** *adjective*
خاوەنی بالووکەی کۆم، کۆمبالووکاوی، کۆم بالووکەدەرکردوو ۞ دارای زگیل مقعد

**cone** /kəʊn, US koʊn/ *noun*
1 قووچکە، قوتکە 2 ڕەحەتی‌ئاسا، نانە بەستەنی 3 میوەی کاج، بەرەکاج، بەری کاژ 4 شتی قوچکەئاسا 5 قووچکەی ڕێگا(وبان) یان نەڕۆیشتن، کەللەی پاراستن (هاتوچۆ) 6 قووچکە یان نووچکەی گڕکان (بنەڕەت: ئینگلیسی نێوەڕاست: لە *cone* فەرەنسی، بە ڕێگای لاتین لە *kōnos* یۆنانی) ۞ 1 مخروط 2 قیف 3 میوەی کاج 4 چیز مخروطی شکل 5 مخروط ایمنی 6 مخروطی آتش‌فشان

**coned** *adjective*
قووچکەئاسا، قووچکەیی، قوتکەیی، کەللەقەندی، کۆفک، گومەزی ۞ مخروطی‌شکل

**coneflower** *noun*
گولەقووچە؟ (هی ئەمریکای باکووری لە تیرەی daisy، گولەکانی قووچن، [*Rudbeckia*, *Echinacea* و توخمەکانی تر]) ۞ روبکی

**conenose** = kissing bug

**cone shell** *noun*
لەیکەقووچ(ک)ە [توخم *Conus*: گەلێ جۆرن] ۞ نوعی نرم‌تن

**Conestoga wagon** *noun*, also Conestoga
جۆرێ کالیسکەی سەرگیراوی چەرخ‌پانی شەش ئەسپە کە بۆ ڕاگوێستنی بار و سوار بەکاردێنرێ ۞ نوعی کالیسکه

**coney** /'kəʊni/ *noun*, also cony, *pl.* coneys
1 (بریتانیا و Heraldry) = کەروێشک 2 جۆرێ grouper ی وردی گەرمێنانی ڕۆژاوای ئەتلانتیک [*Epinephelus fulvus*] (بنەڕەت: لە *cuniculus* لاتین) ۞ 1 خرگوش 2 نوعی ماهی

**confab** /'kɒnfæb, US 'kɑːn-/ *noun*
گەپ، دەمەتەقێ، فشە، قسە (ی دۆستانە)، گاڵتە ۞ گپ، حرف

**confabulation** /kənˌfæbjʊ'leɪʃn/ *noun*
گەپ، دەمەتەقێ، قسە (ی دۆستانە)، گاڵتە ۞ اختلاط، گپ

**confection** /kən'fekʃn/ *noun*
1 شیرینی 2 مرەبا 3 پێکهێنان، لێکدان، تێکەڵاندن 4 تێکەڵە 5 جۆرێ کراسی ژنان کە نەخشی پێچەڵاوپێچی هەیە ۞ 1 شیرینی، تنقلات 2 مربا 3 ترکیب 4 آمیزه 5 کانفکسیون

**confectioner** /kən'fekʃənə(r)/ *noun*
شیرینی‌فرۆش، شەکرچی ۞ شیرینی‌فروش

**confectioner's sugar** = icing sugar

**confectionery** /kən'fekʃənəri, US -ʃəneri/ *noun, pl.* confectioneries
شیرینی، شیرینی‌مەنی، شیرینی‌خانە، شیرینی‌فرۆشی، نوقل و شیرینی ۞ شیرینی‌جات، شیرینی، قنادی، تنقلات

**confederacy** /kən'fedərəsi/ *noun, pl.* confederacies
1 یەک‌کەوتن، یەکێتی، هاوپەیمانی، هاوگرتوویی، یەک‌گرتوویی، alliance 2 فێدراسیۆن، کۆنفیدراسیۆن 3 یەکێتی 4 پیلان، conspiracy 5 (Confederacy) یەکێتی ئەیالەتەکانی باشوور، هەرێم یان ئەیالەتە هاوپەیمانەکان (شەڕی نێوخۆیی ئەمریکا) ۞ 1 اتحاد، اتفاق 2 فدراسیون 3 اتحادیه 4 توطئه 5 (با C) کونفدراسی

**confederal** *adjective*
سەربە کۆنفیدراسیۆن، سەربە هاوپەیمانی ۞ وابسته به کنفدراسیون

**confederate** /kən'fedərət/ *adjective, noun*
*adj* هاوپەیمان، یەک‌گرتوو، یەک‌کەوتوو، allied *n* پیلان‌گێڕ، هاودەست، هاوکار، بەشدار لە تاواندا ۞ *adj* متحد، متفق *n* شریک جرم

**Confederate** /kən'fedərət/ *noun*
(لە ئەمریکا) پشتیوان یان لایەنگری یەکێتی ئەیالەتە باشووری‌یەکان ۞ کونفدرات

**Confederate Memorial Day** *noun*
ڕۆژی یادکردنەوەی کۆنفیدرەیت: چەند ڕۆژێکە دانراوە بۆ یادکردنەوەی سپایی‌یانی Confederacy ۞ کونفدرات موریال دی

**Confederate States** *noun, pl.*
جیابوونەوەی یازدە ئەیالەتی ئەمریکا لە 1860ـ1861دا و کەوتنەوەی شەڕی نێوخۆیی ئەمریکاوە ◌ کونفدرات ستاتس
**confederation** /kən,fedə'reɪʃn/ *noun*
کۆنفیدراسیۆن، هاوپەیمانی، یەکێتی، یەک کەوتوویی (بۆ پەرژەوەندی دوولایەنە) ◌ کنفدراسیون، اتحاد
**confederative** /kən'federeɪtɪv/ *adjective*
یەکێتی یانە، هاوپەیمانانە ◌ اتحادی
**conferee** *noun*
راوێژپێکراو، پرس‌وراپێکراو ◌ مشورت‌شونده
**conference** /'kɒnfərəns, US 'kɑ:n-/ *noun*
1 کۆنفەرانس، کۆمبین، کۆڕ، کۆبوونەوە، جەقین، کۆمان، دان‌وستان، وت‌وویژ، راوێژ، گۆڕینەوەی را، راگۆڕکێ 2 دەستەی بەڕێوەبەرانی مێتۆدیست و کلێسە دیانی یان کریستانیەتەکانی تر ◌ 1 کنفرانس، گردهمایی، جلسه، مذاکره، مشاوره، تبادل نظر 2 کنفرانس
**Conference** /'kɒnfərəns, US 'kɑ:n-/ *noun*
جۆرێ هەرمێی گۆشت‌توند ◌ نوعی گلابی
**conferential** /,kɑ:nfə'renʃəl/ *adjective*
راوێژکاری‌یانە، راوێژگەرانە، راوێژگەری‌یانە ◌ مشاوره‌ای
**conferment** /kən'fɜ:mənt, US -'fɜ:rm-/ *noun*
1 پێدان، پێ‌بەخشین 2 راوێژ، پرس‌ورا ◌ 1 اعطا 2 مشورت، رایزنی
**conferrable** /kən'fɜ:rəbl/ *adjective*
پێی دەدرێ، بەخشەنی، پێی دەبخشرێ، پەی دەدرێ ◌ قابل اعطاء
**confer(r)ee** /,kɑ:nfə:'ri/ *noun*
پێ‌بەخشراو، پێدراو (کەسێ کە شتێکی پێدراوە) ◌ کانفری
**conferrer** *noun*
راوێژکار، بەپرس‌ورا ◌ مشورت‌کننده
**confessant** *noun*
مرۆی درکێنەر یان دان‌پیانەر (بۆ قەشەیێ) ◌ آدم مقر
**confessed** /kən'fesɪd/ *adjective*
ئاشکرا، بەرچاو، بێ‌پەردە، بەدیارەوە ◌ علنی
**confessedly** /kən'fesɪdli/ *adverb*
بە رێگای دان‌پیانانەوە ◌ بە طور اقراری
**confession** /kən'feʃn/ *noun*
1 دان‌پیانان، پێ‌لێنان، درکاندن، چوونەژێر، پێ‌ناسین 2 نامەی دان‌پیانان 3 دەربڕین، هێنانەزمان، راگەیاندن، دانەزانین 4 کۆمەڵی ئایینی یان دینی ◌ 1 اعتراف، اقرار، اذعان 2 اعتراف‌نامە 3 اظهار، اعلام 4 کانفسیون
**confessional** /kən'feʃənl/ *adjective*
1 جێگا یان شوێنی دان‌پیانان، درکانگە (کلێسە) 2 دان‌پیانەرانە، درکێنەرانە ◌ 1 جایگاه اعتراف 2 وابسته به اعتراف
**confessionary** /kən'feʃənerɪ/ *adjective*
دان‌پیانەرانە، درکێنەرانە ◌ اعترافی، اقراری
**confessor** /kən'fesə(r)/ *noun,* also confesser
قەشەی گوێڕادێری (قەشە) گوێڕادێری دان‌پیانان، دان‌پیانەر، درکێنەر؛ کەسێ کە بە ئاشکرایی پێ لە باوەڕی خۆی دەنێ ◌ اعتراف‌کننده؛ کانفسور
**confetti** /kən'feti/ *noun*
پەخشانە، پوولەکەکاغز، زریقەوبریقە، کاغزەوەشان، کاغزپەخشانە (بەسەر بووک و زاوای هەڵدەخەنەوە) ◌ کانفتی
**confidant** /'kɒnfɪdænt, ,kɒnfɪ'dɑ:nt, US 'kɑ:nfɪdænt/ *noun*
رازگر، رازدار، قسەقوتدەر، دەم‌قورس، جێی‌باوەڕ، پەردەپۆش، سەرپۆش: *a close/trusted confidant of the President* ◌ محرم راز، معتمد
**confidence** /'kɒnfɪdəns, US 'kɑ:n-/ *noun*
1 باوەڕی، جێی‌باوەڕبوون، باوەڕپێکراوی، متمانە، پشت‌گەرمی، پشت‌ئەستووری، دڵنیایی، بەستەهی، بەستەیی، یەک‌چاوبوونەوە 2 لەخۆڕادیتن، لەخۆڕاپەرموون، راپەرموون، خۆباوەڕی 3 راز، سر 4 وێران، گوستاخی ◌ 1 اعتماد، اطمینان 2 اعتماد به نفس 3 راز 4 جرأت
**confidence game** = con
**confidence man** *noun*
دەسبڕ، زۆڵ ◌ شیاد
**confidence trick** = con
**confident** /'kɒnfɪdənt, US 'kɑ:n-/ *adjective*
1 دڵنیا، پشت‌گەرم، پشت‌ئەستوور: *confident that conditions will improve* 2 گوستاخ، بوێر، نەترس 3 رازگر، رازدار، سەرپۆش 4 باوەڕبەخۆ، لەخۆڕادیتوو ◌ 1 مطمئن 2 جسور 3 محرم راز 4 دارای اعتماد به نفس
**confidential** /,kɒnfɪ'denʃl, US ,kɑ:n-/ *adjective*
1 نهێنی، تایبەتی: *confidential information* 2 رازدار، نهێنی‌پۆش، سەرپۆش، دەم‌قورس، قسەقوتدەر، جێی‌باوەڕ، جێی‌متمانە، باوەڕپێکراو، قسەنەگێڕەوە ◌ 1 محرمانه 2 محرم
**confidentiality** /,kɒnfɪ,denʃi'æləti, US ,kɑ:n-/ *noun,* also confidentialness
نهێنی‌بوون، تایبەتی‌بوون، رازداری، قسەقوتدەری، رازداری، سرپۆشی ◌ محرمانه بودن، رازداری
**confidentially** /-ʃəli/ *adverb*
نهێنی‌یانە، بە شێوەیەکی نهێنی، بە شێوەیەکی تایبەتی ◌ به طور محرمانه
**confiding** /kən'faɪdɪŋ/ *adjective*

خۆش‌باوەڕ، زووباوەڕ، سادە، رازیێژ، قسەگێڕەوە ○ خوش‌باور

**confidingly** /kən'faɪdɪŋli/ *adverb*

خۆش‌باوەڕانە، زووباوەڕانە ○ خوش‌باورانە

**configuration** /kən͵fɪgə'reɪʃn, US -͵fɪgjə'r-/ *noun*

1 ڕێکخستن، بیچم، شێوە، ڕوخسار 2 (ئەو کەل‌وپەل و بەرنامانەی کە دەزگایەکی کامپیوتێر دادەڕێژن و ئەو شێوەیەش کە دەخرێنەکار) داڕشتن، ڕێکخستن 3 (کیمیا) ڕێکخستن: پێوەندی سێلایی چەسپیوی گەردیلەکانی گەردێ molecule 4 (دەروونناسی) = gestalt ○ 1 آرایش، ترکیب، شکل 2 پیکربندی (کامپیوتر) 3 آرایش فضایی (شیمی)

**configurational** *adjective*

1 سەربە داڕشتن، سەربە ڕێکخستن 2 (کیمیا) سەربە ڕێکخستن ○ 1 وابستە بە پیکربندی 2 وابستە بە آرایش فضایی (شیمی)

**confined** /kən'faɪnd/ *adjective*

تەنگ، بەرتەسک، کنگەجن، تەنگەبەر، چکۆلە، قەتیس، تەسک، دەوردراو، گیراو، دیوارکراو: *It is cruel to keep animals in confined spaces.* ○ محدود، بستە

**confinement** /kən'faɪnmənt/ *noun*

1 زیندان، گرتووخانە، بەندیخانە 2 گلدانەوە، دەس‌بەسەری، ڕاگرتن، گێڕانەوە، گرتن 3 منداڵبوون 4 دیاریکردن، دەس‌نیشانکردن 5 سنووداری، بەرتەنگی ○ 1 زندان 2 بازداشت 3 زایمان 4 تحدید 5 محدودیت

**confines** /'kɒnfaɪnz, US 'kɑːn-/ *noun, pl.*

سنوور، ڕادە، تخوب، سەرحەد ○ مرز، حدود

**confirmability** /kən͵fɜːmə'bɪləti/ *noun*

لەسەلماندن‌هاتوویی ○ تأییدپذیری

**confirmable** /kən'fɜːməbl/ *adjective*

لەسەلماندن‌هاتوو ○ تأییدپذیر

**confirmation** /͵kɒnfə'meɪʃn, US ͵kɑːnfər'm-/ *noun*

1 پەسندکردن، مۆرکردن، سەلماندن، بەڕاستدانان، جەختکردن، چەسپاندن، باوەڕاندن، باوەڕی‌پێدان 2 سەقامگیری، جێگیری 3 بەڵگە(ی بڕینەرەوە)، پڕنۆ 4 (کریستانیەت) ڕێوڕەسمی وەرگرتنی بە ئەندامێتی کلیسە: *a confirmation service* (*adj* conformational) ○ 1 تأیید، اثبات، تصدیق، تثبیت 2 استقرار 3 مدرک 4 مراسم پذیرش عضویت کلیسا

**confirmative** /kən'fɜːməɪv/ *adjective*, also -matory /kən'fɜːmətəʊri/

پەسندکەر، مۆرکەر، سەلمێنەر، بەڕاستدانەر ○ تأییدکنندە، اثبات‌کنندە

**confirmed** /kən'fɜːmd, US -'fɜːrmd/ *adjective*

1 یەکلاییکراوە، دەرکەوتوو، چەسپیو، ڕوونەوەبوو، پەسندکراو، مۆرکراو، سەلمێنراو 2 بنج‌بەست، ڕیشەداکوتاو، تەکاننەخواردوو 3 هەمیشەیی، درێژخایەن، زۆرپێچوو 4 خووگرتوو، فێر، گیرۆدە ○ 1 محرز، تصدیق‌شدە، اثبات‌شدە 2 ریشەکردە، مادام‌العمر 3 مزمن 4 معتاد

**confirmer** *noun*

پەسندکەر، مۆرکەر، سەلمێنەر، بەڕاستدانەر ○ تأییدکنندە، اثبات‌کنندە

**confirming** *noun*

پەسندکەر، مۆرکەر، سەلمێنەر، بەڕاستدانەر ○ تأییدکنندە، اثبات‌کنندە

**confiscable** /kən'fɪskebl/ *adjective*

لەگرتن‌هاتوو، دەسی‌بەسەرا دەگیرێ، زەوت دەکرێ ○ مصادرەکردنی

**confiscation** /͵kɒnfɪ'skeɪʃn, US ͵kɑːn-/ *noun*

گرتن، زەوت(کردن)، داگیرکردن، دەس‌بەسەراگرتن: *If found guilty of this crime they face heavy fines, confiscation of goods and even imprisonment* ○ مصادرە، ضبط، توقیف

**confiscator** *noun*

دەس‌بەسەراگر، وتکەر، داگیرکەر ○ مصادرەکنندە

**confiscatory** /kən'fɪskətəʊri/ *adjective*

زەوتکراو، دەس‌بەسەراگیراو، داگیرکراو، زەوتی ○ توقیفی

**confiteor** *noun*

نوێژی دانپیانان، نوێژەدرکانە ○ صلاەالاعتراف

**conflagrant** /kən'fleɪgrənt/ *adjective*

گڕگرتوو، داگیرساو، نێل‌دراو ○ شعلەور

**conflagration** /͵kɒnflə'greɪʃn, US ͵kɑːn-/ *noun*

1 ئاورگرتن، سووتان، سووتمان، ئاوری گەورە، ئاگربەربوونەوە، شەوەتین (ماڵوێرانکەر) 2 کوشت‌وکوشتار، کوشت‌وبڕ، قەڵت‌وبڕ، خوێن و خوێن‌ڕێژی، شەڕی ماڵوێرانکەر یان خاپوورکەر ○ 1 حریق بزرگ 2 خون‌ریزی فاجعەآمیز

**conflation** /kən'fleɪʃn/ *noun*

تێکخستن، تێکهەڵکێشان، لێکدان (دوو خوێندنەوەی جیاواز)، blend، fusion ○ ادغام، تلفیق

**conflict** /'kɒnflɪkt, US 'kɑːn-/ *noun*

تێکهەڵچوون، پێکادان، لێکدان، شەڕ، شەڕوکێشە، کێشە، مشت‌ومڕ، جووڕە، کێشمەکێش، ناکۆکی، ململانێ، کێشەوبەرە، دژبەری، دژایەتی، یەک‌نەگرتنەوە، جیاوازی ○ درگیری، نزاع، تعارض، اختلاف، تضاد، مغایرت

**conflicting** *adjective*

دژ، پێکدژ، یەک نەگرەوە، جیاواز، ناکۆک، دژبەر ◌ متضاد، مغایر، مخالف

**confliction** /kən'flɪkʃn/ *noun*
ناکۆکی، جیاوازی، یەک نەگرتنەوە، دژایەتی ◌ مغایرت

**confluence** /'kɒnfluəns, US 'kɑ:n-/ *noun*, also conflux /'kɒnflʌks/
1 هاوڕێگە، خاڵ یان شوێنی چوونەوەسەریەک (دوو چۆم)، دواوان، جێگای پێکگەیشتنەوە، جەمسەر، پێکگەیشتنگە 2 کۆمەڵگا، کۆمبین ◌ 1 نقطە یا محل تلاقی 2 اجتماع

**confluent** /'kɒnfluənst 'kɑ:n-/ *adjective, noun*
*adj* هاوڕێ، سەریەکچوو، چووەوەسەریەک، یەک گرەوە، پێکەوەگەیشتوو: *confluent* tributary = *n pustules* ◌ متلاقی

**confocal** /kɒn'fəuk(ə)l/ *adjective*
هاوتیشکۆ: *confocal* ◊ *confocal ellipses* *lenses* ◌ همکانونە

**confocally** /kɒn'fəuk(ə)li/ *adverb*
هاوتیشکۆیانە، بە شێوەیێکی هاوتیشکۆ ◌ بە طور همکانونە

**conform** /kən'fɔ:m/ *noun*
مرۆی گوێڕایەڵ، شوێنکەوتە ◌ آدم مطیع، پیرو

**conformability** /kən,fɔ:mə'bɪləti/ *noun*
یەکگەوتوویی، گونجان، جۆربوون ◌ مطابقت

**conformable** /kən'fɔ:məbl/ *adjective*
1 یەککەوتوو، گونجاو، جۆر(دەرهاتوو): 2 *conduct conformable to their principles* قسەبیس، گوێڕایەڵ، ملکەچ ◌ 1 مطابق 2 حرف‌شنو، مطیع

**conformably** /kən'fɔ:məbli/ *adverb*
یەککەوتووانە، بە شێوەیەکی گونجاو ◌ بە طور مطابق

**conformation** /,kɒnfɔ:'meɪʃn, US ,kɑ:nfɔ:r'm-/ *noun*
1 گونجاندن، سازاندن، ڕێکخستن، یەککەوتن، ڕێککەوتن 2 پێکهێنان، دروستکردن، پێکهاتە، جێ‌کردن 3 شێوە، بیچم، ڕوخسار ◌ 1 تطبیق، توافق 2 ترکیب، ساخت 3 شکل

**conformational** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە conformation ـەوە هەیە ◌ وابستە بە conformation

**conformer** *noun*
(کیمیا) جۆرێ ئاوێتە کە ڕێکخستنێکی تایبەتی گەردیلەیی هەیە (تێکەڵەی *conformational* + *isomer*) ◌ کونفورمر

**conformism** /kən'fɔ:mɪzəm, US -'fɔ:rm-/ *noun*
خۆگونجاندن، گونجانگەری، گونجانخوازی، گونجاویتی، یەککەوتوویی ◌ همنواگری

**conformist** /kən'fɔ:mɪst, US -'fɔ:rm-/ *noun*
خۆگونجێن، گونجانگەر، گونجانخواز، یەککەوتوو، نەریتگیر، گونجاو (کەسێ کە ڕێوشوێنی کۆمەڵ دەگرێتەبەر) ◌ همنواگرا، همرنگ با جماعت

**conformity** /kən'fɔ:məti, US -'fɔ:rm-/ *noun*, also conformance /kən'fɔ:məns/, also conformities
1 گونجان، یەککەوتوویی، نەریتگیری، هاوشێوەیی، هاوچەشنی، هاوڕێڕەوی، سازان، دەق‌گرتن، کۆکی، *conformity to* :agreement 2 (زەوی‌ناسی) چینە نیشتووە دوابەدوای یەکەکان (یان لەسەریەکەکان) *social custom* ◌ 1 همنوایی، تطابق، سازگاری 2 طبقات رسوبی متوالی

**confounded** /kən'faundɪd/ *adjective*
1 پەشۆکاو، عەبەسراو، تاساو، *confused* 2 لەعنەتی، گڵاو، پیس، گووتێبوو، قیرتێبوو، گوو، *damned* ◌ 1 مبهوت 2 قبیح، لعنتی

**confoundedly** /kən'faundɪdli/ *adverb*
یەکجار، زۆر ◌ خیلی

**confraternity** /,kɒnfrə'tɜ:nɪti, US ,kɑ:n-/ *noun, pl.* confraternities
کۆمەڵەی دینی یان خێرخوازی ◌ اخوت، انجمن اخوت

**confrere** /'kɑ:nfre(r)/ *noun*
ڕفیق، ڕەفیق، هەڤاڵ، هاوڕێ ◌ رفیق

**confrontation** /,kɒnfrʌn'teɪʃn, US ,kɑ:nfrən-/ *noun*
ڕووبەڕووبوونەوە، بەرەنگاری، بەرەنگاربوونەوە، بەرەوڕوو(کەوتن): *She wanted to avoid* - ◊ *another confrontation with her father* ◌ *ation between employers and unions* مواجهە، رویارویی، درگیری

**confrontational** /,kɒnfrʌn'teɪʃnl, US ,kɑ:nfrən-/ *adjective*
مشتومڕلەسەر، کێشەلەسەر، جەنجاڵی، هاندەرانە، بەرەنگارییانە، شەڕخوازانە ◌ ستیزەجویانە، تحریک‌آمیز، جنجالی

**Confucian** /kən'fju:ʃən/ *adjective, noun*, Chinese, K'ung Fu-tzu
*adj* سەربە کۆنفۆسیۆس یان کۆنفۆسیۆس‌باوەڕی *n* کۆنفۆسیۆسی، شوێنکەوتوو یان پەیڕەوی کۆنفۆسیۆس Confucius (مامۆستا و فیلسوفی چینی (دەوروبەری) 551–479 پێش‌زایین) ◌ کنفوسیوسی

**Confucianism** *noun*
کۆنفۆسیۆس‌باوەڕی: سیستمی ئامۆژگاریی‌یە ئاکاری و فەلسەفی‌یەکانی کۆنفۆسیۆس ◌ کنفوسیوس گرایی

**Confucianist** *noun*

بەستن، توندبوون، خۆگرتن، مەیین، رچان، گیرسان، گیروبەندتێکەوتن، گوروان، گروان ◌ انجماد، انعقاد، بستگی

**congelation** /ˌkɒndʒəˈleɪʃ(ə)n/ *noun*
مەیین، بەستن، رچان، رەقبوون، توندبوون، گوروان، گروان، مەیاندن ◌ انجماد، انعقاد، دلمه، بستگی، تخثیر

**congener** /ˈkɒndʒɪnə, US kənˈdʒi:nə/ *noun*
هاورەگەز، هاوجۆر، هاوتیرە (رووەک یان گیانەوەری) ◌ همجنس

**congeneric** /ˌkɒndʒɪˈnerɪk/ *adjective*, also congenerous/kənˈdʒen(ə)rəs/
هاورەگەز، هاوجۆر، هاورەچەڵەک، هاوتیرە ◌ متجانس

**congenial** /kənˈdʒi:niəl/ *adjective*
1 خۆش، بەردڵ، دڵگوشاد، دڵفەریح، دڵگیر: *a* 2 گونجاو، کارخۆش، *congenial atmosphere* هاوبیر، ریک کەوتوو، هاوخوو، پێکەوەهەڵکردوو ◌ 1 مطلوب، مطبوع 2 سازگار، هممشرب

**congeniality** /kənˌdʒi:niˈæləti/ *noun*
1 خۆشی، بەردڵی 2 گونجاوی، کارخۆشی، هاوبیری، هاوخوویی، یەککەوتوویی، سازاوی، پێکەوەهەڵکردوویی ◌ 1 مطبوعیت 2 سازگاری، هممشربی، توافق

**congenially** /kənˈdʒi:niəli/ *adverb*
گونجاوانە، هاوخووانە، ریککەوتووانە ◌ بە طور هممشرب یا سازگار

**congenital** /kənˈdʒenɪtl/ *adjective*
زگماکی، سکماک، بۆماوەیی (نەخۆشی و هتد)، ودمی، خواکرد، خۆماکی، زاتی، خودایی: *-ital abnormalities ◊ congenital deafness*
◌ مادرزادی، موروثی، فطری، ذاتی

**congenitally** /-təli/ *adverb*
زگماکانە، بە شێوەیەکی زگماک، لە خواییەوە ◌ بە طور مادرزاد، ذاتاً

**conger** /ˈkɒŋgə(r), US ˈkɑ:ŋ-/ *noun*, also conger eel
*Conger conger*] (گیانەوەرناسی) مارماسی (ئەورووپا)، *C. oceanica* (ئەمریکا) و جۆرەکانی تر] ◌ مارماهی

**congeries** /kɒnˈdʒɪəri:z, US -ɪz/ *noun, pl.* same
کەڵەکە، تۆپەڵە، کۆمەڵە، کۆما، کۆگا، لۆدە، collection ,aggregation ◌ مجموعە، تودە

**congested** /kənˈdʒestɪd/ *adjective*
1 شلوقایی، شلوق، چڕەبەندان، ئاپۆرەبەندان، شانەترنجی، قەرەبالغ، جەنجال: *congested city streets* 2 هەلاژراو، خوێن تێزاو، سوورەوەبوو 3 (لووت) گیراو، کپ ◌ 1

کۆنفۆسیۆس باوەڕ ◌ کنفوسیوس گرا

**confused** /kənˈfju:zd/ *adjective*
شێواو، شپرزە، سەرلێشێواو، سەرکوێر، واقوڕماو، شڵەژاو، تاساو، پەشۆکاو: - *I'm used—say all that again* ◌ آشفته، سردرگم، سراسیمه

**confusedly** /kənˈfju:zədli/ *adverb*
پەشۆکاوانە، بە پەشۆکاوی ◌ با سراسیمگی

**confusedness** *noun*
پەشۆکاوی، عەبەسراوی، دەسەپاچەیی، تاساوی، گێژی، وڕی ◌ دستپاچگی، سراسیمگی

**confusing** /kənˈfju:zɪŋ/ *adjective*
پەشۆکێنەر، گێژکەر، نەڕوون، نادیار ◌ گیج‌کننده، غیرواضح

**confusingly** /kənˈfju:zɪŋli/ *adverb*
گێژکەرانە، پەشۆکێنەرانە ◌ بە طور گیج‌کننده

**confusion** /kənˈfju:ʒn/ *noun*
1 سەرلێشێواوی، سەرگەردانی، سەرکوێری، گێژی، وڕی، کاسی، پەشۆکاوی، تاساوی، هێوان، واقوڕماوی، خەجلان، واقمان، سەرسووڕمان، تێکچوون، شڵەژان، شڵەژاوی، شێوان، پشێوی، ئاژاوە، پاشاگەردانی 2 هەڵە، شاشی، لێشێوان ◌ 1 سردرگمی، سراسیمگی، دستپاچگی، حیرت، بهت، اختلال، آشفتگی، اغتشاش 2 اشتباه

**confutation** /ˌkɒnfju:ˈteɪʃn/ *noun*
پووچەڵکردنەوە، پووچ کردنەوە، بەتاڵ کردنەوە، هەڵوەشاندنەوە، بەرپەرچدانەوە، رەتکردنەوە ◌ ابطال، رد

**conga** /ˈkɒŋgə, US ˈkɑ:ŋgə/ *noun*
کانگا 1 جۆرێ هەڵپەڕکێی کرژی ئەمریکای باشوور کە دەستەی هەڵپەڕکێ بە دوای سەرچۆپی دەکەون 2 پارچە موسیقای ئەو هەڵپەڕکێیە ◌ کونگا

**conge** /ˈkɒnʒeɪ, US kɔ:nˈʒeɪ or ˈkɑ:n- *noun*
1 دەستووری رۆیشتن یان رۆیشتنەوە (مەرەخەسی) 2 ناردنەوە، مۆڵەتپێدان، مەرەخەس کردن 3 بۆچەمانەوە، سەرچەمانە، دووقەدبوون، کوڕنش، دەستەونەزەر، داهاتنەوە 4 مالاوایی ◌ 1 اجازەی عزیمت یا مرخصی 2 ترخیص 3 تعظیم 4 وداع

**congealed** *adjective*
مەیو، بەستوو، جەڵتە، جەڵغە، رچاو ◌ منعقدشده، لخته

**congealing point** *noun*
خاڵی بەستن یان مەیین ◌ نقطەی انعقاد

**congealable** /kənˈdʒ:ləbl/ *adjective*
مەیو، لەمەیین‌هاتوو، مەیەنی، دەمەیێن ◌ قابل انعقاد

**congealment** *noun*

پرازدحام 2 پرخون 3 گرفته (بینی)

**congestion** /kən'dʒestʃən/ *noun*

1 شـلوقی، ئـاپۆره، چرەبەنـدان، قەرەباڵـغی، پاڵەپەستۆ، تێکچرژان، ڕێبەندان 2 خوێن‌تێزان، پڕخوێنی، هـەڵاوزان، سـووربوونەوە 3 (لـووت) گیران، کپ‌بوون ◌ 1 ازدحام، راهبندان 2 احتقان، پرخونی 3 گرفتگی

**congius** /'kɒndʒɪəs/ *noun, pl.* congii /'kɒndʒɪʌɪ/

پێـوەرێکی شـلەی ڕۆمـی کـۆن، بەرامبـەر بـە هەشت‌یەکی amphora (بنەڕەت: لە لاتینـەوە) ◌ کانجیوس

**conglobate** /kɑ:n'gləʊbeɪt, 'kɑ:n-, 'kɑ:ŋ-/ *adjective*

خڕ، گروڤەر، تۆپەڵ‌ئاسا ◌ گرد

**conglobation** *noun*

خڕانـدن، خـڕکردن، خڕهەڵـدان، تۆپەڵانـدن، گلۆڵەکردن، گلۆلاندن، گردکردن ◌ گرد کردن

**conglomerate** /kən'glɒmərət, US -'glɑ:m-/ *noun, adjective*

*n* 1 تۆپەڵـە، تۆپەڵـک، تێکەڵـە، تۆپلاخـە، بـەردەجۆش، شـەفتەی خۆرسـک، کوڵـۆک 2 داموودەزگا، گەورەکۆمپانی (بازرگانی): *a medis adj conglomerate* سـەربـە یـان پێـوەنـدی بـە conglomerate ـەوە هەیە ◌ *n* 1 تـوده، آمیـزه، جوش‌سنگ 2 مجتمع *adj* وابسته به کانگلومیرت

**conglomeration** /kən,glɒmə'reɪʃn, US -,glɑ:m-/ *noun*

تۆپەڵـە، تۆپەڵـک، کۆمەڵـە، کۆمەڵـکە، تێکەڵـە، خڕانـدن، خـڕکردن، خڕهەڵـدان، خـڕەوەبووی، گـلـۆلاندن، تۆپلاخـەکردن، تۆپەڵانـدن، گـلۆڵەکراوی: *a conglomeration of buildings of different sizes and styles* ◌ توده، مجموعه، آمیزه، گردکردن، کونگلومراسیون

**conglutination** /kən,glu:tə'neɪʃn/ *noun*

لێـک‌گیرکـردن، پێکالکانـدن، پێکەوەنووسـاندن، یـەک‌پێگـرتن، پێکاچەسـپاندن، جۆشـدان ◌ التصاق، بەهم‌چسبانی

**conglutinative** /kən'glu:tɪneɪtɪv/ *adjective*

پێکالکێن، یەک‌پێگر، جۆشدەر، پێکەوەنووسێن، پێکەوەچەسپێن ◌ ملتصق، بەهم‌چسباننده

**Congo dye** *noun*

ڕەنگی کۆنگۆ: ئەو ڕەنگانەی کە لە Benzidine دەگیرێنەوە ◌ رنگ کونگو

**Congolese** /,kɒŋgə'li:z/ *noun (pl.* same), *adjective*

*n* 1 دانیشتوو یان ڕەسەنی کۆنگۆ یان کۆماری دیموکراتیکی کۆنگۆ (جاران Zaire) 2 هەریەک لە زمانە بانتۆیی‌یەکانی ناوچەی کۆنگۆ *adj* سەربە کۆنگۆ یان کۆماری دیموکراتیکی کۆنگۆ ◌ کونگویی

**Congo red** *noun*

ڕەنگـی سـووری کۆنگـۆ: بـە شـێوگی $C_{32}H_{22}N_6Na_2O_6S_2$، لە ئالکالین‌دا سوور و لە گیراوەی ترشەڵۆکی‌دا شینە ◌ رنگ قرمز کونگو

**congrats** /kən'græts/ *noun, pl.*

(نافەرمی) پیرۆزبایی ◌ تبریک

**congratulation** /kən,grætʃu'leɪʃn/ *noun, interjection*

*n* پیرۆزبـایی، چاوڕۆشـنی (لـێ‌کـردن) *interj* پـیرۆز بـێ، چاوتـان ڕۆشـن، چاوتـان ڕوون، مەبارەکـە، مـەبارەک بـێ، خۆشـی لـە خـۆت: ◌ *Congratulations on your exam results* تبریک *interj* مبارک‌باد

**congratulations** *noun, pl.*

پیرۆزبایی، چـاوڕوونی، چاوڕۆشـنی (لێ‌کردن) ◌ تبریک

**congratulator** *noun*

پیرۆزبایی‌کەر، پیرۆزبایی‌بێژ ◌ تبریک‌گو

**congratulatory** /kən,grætʃu'leɪtəri, US kən'grætʃələtɔ:ri/ *adjective,* also congratulative

*a congratulatory message* :پیرۆزبـایی‌یانـە ◌ تبریک‌آمیز

**congregant** /'kɒŋgrɪg(ə)nt/ *noun*

ئەندامی کۆمەڵی خواپەرستان یا نوێژکـەران ◌ عضو گروه عبادت‌کنندگان

**congregation** /,kɒŋgrɪ'geɪʃn, US ,kɑ:ŋ-/ *noun*

1 کۆمەڵی خواپەرستان یان نوێژکەران (بێجگەلە قەشـە و کـۆر، لـە کلێسـەیەک‌دا): *The congregation stood to sing the hymn* 2 کۆمەڵـە، دەسـتە، جەماعـەت، کۆکردنـەوە، کۆبوونەوە، خڕبوونەوە 3 (لە کلێسـەی کـاتۆلیکی ڕۆمی‌دا) لیژنەی هەمیشەیی کۆلێژی کاردیناڵەکان ◌ 1 گروه عبـادت‌کننـدگان 2 اجتمـاع، جماعـت، گردآوری، جمع‌شدگی 3 کانگریگاسیون

**congregational** /-ʃənl/ *adjective*

کۆمەڵـی، سـەربە کۆمەڵـە، کۆمەڵـەیی، سـەربە کۆمەڵـی خواپەرسـتان یـان نوێژکـەران: *-regational singing* ◌ جماعتی، کونگرسیونال

**Congregational** /-ʃənl/ *adjective*

کانگریـشنال (سـەربە یـەکێتی کلێسـە کریستانیەتەکان کە لەودا هەر congregationی بەرپرسی کاروباری خۆیەتی) ◌ کونگرسیونال

**Congregationalism** /,kɒŋgrɪ'geɪʃnəlɪzəm, US ,kɑ:ŋ-/ *noun*

(ڕێکخستە) سەربەخۆیی یان ئـازادی کلێسـە (و ئەندامانی، خۆجێیی) ◌ کونگرسیونالیسم

**Congregationalist** /,kɒŋgrɪ'geɪʃnəlɪst, US ,kɑ:ŋ-/ *noun, adjective*

*n* لایەنگری سەربەخۆیی یان ئازادی کلێسە *adj*

کۆنگریگاسیۆنالیستی، کانگریگێشنالیستی ◌ *n*
کونگرسیونالیست *adj* کونگرسیونالیستی
**Congress** /'kɒŋgres, US 'kɑːŋgrəs/ *noun*
کۆنگرێس: ئەنجومەنی قانوون دانان، لە ئەمریکا و هێندێ وڵاتی تر ◌ کنگره
**congress** /'kɒŋgres, US 'kɑːŋgrəs/ *noun*
1 کۆنگرێس، کۆنگرە، کۆمان، کۆبوونەوە، کۆمبین، جڤین، کۆڕ، دانیشتن 2 ئەنجومەن (قانووندانان) 3 دیدار، یەکتربینین، سەردان 4 نزیکی، هاوجینیی ◌ 1 کنگره، مجمع، همایش 2 مجلس (قانونگذاری) 3 ملاقات 4 جماع
**congressional** /kən'greʃənl/ *adjective*
سەربە کۆنگرێس (قانووندانان، ئەمریکا)، کۆبوونەوەیی، جڤینی: *a congressional committee/bill* ◌ وابسته به کنگره، همایشی
**congressionally** *adverb*
بە شێوەیەکی کۆبوونەوەیی ◌ به طور کنگره‌ای
**Congressional Medal** = Medal of Honour
**Congressman** /'kɒŋgresmən, US 'kɑːŋgrəs-/ *noun, pl.* -ngressmen
(لە ئەمریکا) ئەندام یان نوێنەری کۆنگرێس ◌ نمایندهٔ کنگره
**Congressperson** /-pɜːsn, US -pɜːrsn *noun*
(لە ئەمریکا) ئەندام یان نوێنەری کۆنگرێس ◌ نمایندهٔ کنگره
**Congresswoman** /'kɒŋgreswʊmən, US 'kɑːŋgrəs-/ *noun, pl.* -men
(لە ئەمریکا) ئەندامی کۆنگرێس (ژن ب.ت. لە ئەنجومەنی نوێنەراندا) ◌ نمایندهٔ کنگره (زن)
**congruence** /'kɒŋgruəns, US 'kɑːŋ-/ *noun,* also congruency
1 لێکچوون، هاوشێوەیی 2 ڕێککەوتن، یەککەوتن، یەکگرتنەوە، یەکگیری، سازان، گونجان 3 بەرامبەری، جووتی، جووتبوون، هاوئەندازەیی، هاوقەوارەیی، بەقەدیەکی، یەکسانی، هاوڕێکی، هاوتەرازی 4 گونجاوی 5 (بیرکاری و ئەندازە) بەرامبەری، وەکیەکی ◌ 1 تشابه 2 توافق، موافقت 3 تساوی 4 مناسبت 5 هم‌نهشتی
**congruent** /'kɒŋgruənt, US 'kɑːŋ-/ *adjective*
1 بەرامبەر، بەقەدیەک، جووت، یەکسان، هاوئەندازە، هاوقەوارە، هاومیزان، هاوڕێک، هاوتەراز 2 گونجاو، لەبار، شیاو 3 یەککەوتوو، ڕێککەوتوو، سازاو 4 (بیرکاری و ئەندازە) بەرامبەر، وەکیەک ◌ 1 هم‌ارز، معادل 2 مناسب 3 سازگار، موافق 4 هم‌نهشت
**congruity** /-'gruːɪti/ *noun, pl.* congruities
1 سازان، گونجان، یەککەوتن، ڕێککەوتن، دەقی، یەکگرتنەوە، یەکانگیری 2 گونجاوی 3 بەرامبەری، یەکسانی، هاومیزانی، هاوڕێکی، هاوتەرازی، جووتی 4 خاڵی یەککەوتن یان جووتبوون، جەمسەر ◌ 1 سازگاری، سازش، هم‌خوانی 2 تناسب 3 هم‌ارزی 4 نقطهٔ تلاقی
**congruous** /'kɒŋgruəs/ *adjective*
1 گونجاو، لەبار، شیاو 2 جووت، دەق، یەککەوتوو، سازاو: *a congruous theme* ◌ 1 مناسب، درخور 2 مطابق، سازگار
**conic** /'kɒnɪk, US 'kɑːnɪk/ *adjective*
1 قووچکەیی، قووچەکی، گومەزی، کۆفکی، کەڵلەقەندی، ◌ conic section = 2 conical مخروطی
**conical** /'kɒnɪkl, US 'kɑːn-/ *adjective*
قووچ، قووچەکی، قووچکەئاسا، کەڵلەقەندی، گومەزئاسا، گومەزی، قووچکەیی: *conical projection*: نەخشەکێشی گومەزی ◌ مخروطی شکل
**conically** /'kɒnɪkli, US 'kɑːn-/ *adverb*
قووچانە، بە شێوەیێکی قووچکەیی ◌ به طور مخروطی شکل
**conic section** *noun*
بڕگەی قووچکەیی یا گومەزی ◌ مقطع مخروطی
**conics** *noun, pl.*
قووچکان، قووچکەمەنی، کۆقووچک ◌ مخروطات
**conical surface** *noun*
(بیرکاری) ڕووی قووچکەیی یان گومەزی، ئاستی گومەزی ◌ سطح مخروطی
**conidial** *adjective*
(ڕووەکناسی) تۆزیلکەیی، سەربە تۆزیلکە ◌ وابسته به کونیدیوم
**conidium** /kəʊ'nɪdiəm/ *noun, pl.* conidia /-dɪə/
(ڕووەکناسی) تۆزیلکە، سپۆر یان تووێکی نارەگەزی کە لەسەر نووکی fungiدا بەرهەم دێ (بنەڕەت: لە لاتینی نوێ، لە *konis* یۆنانی "تۆز" + پاشگری چکۆلاندنی *-idium*) ◌ کونیدیوم
**coniferous** /kə'nɪfərəs/ *adjective*
(سەربە) سنەوبەرییەکان، لە تیرەی سنەوبەرەکان ◌ (وابسته به) مخروطیان
**conifer(s)** /'kɒnɪfə, US 'kəʊn-/ *noun*
سنەوبەرییەکان، تیرەسنەوبەر [دەستە Coniferales] ◌ مخروطیان
**coniine** /'kəʊnɪiːn/ *noun*
(کیمیا) کۆنین: ئاوێتەیێکی ژاراوی هەڵمیو volatile [$C_8H_{17}N$]، لە hemlock و گیاکانی ترا هەیە ◌ کونین
**conj** = conjunction
**conjecturable** /k'dʒəktʃərəbl/ *adjective*
وادەزانری، وادادەنری، شیاوی مەزندە ◌

حدس‌زدنی

**conjectural** /kən'dʒektʃərəl/ *adjective*
وادانه‌رانـه، مه‌زنـده‌یی، گومـانی، گـوتره‌یی، وادانراو، وازانراو، به‌پێی وادانان، له‌سه‌ر بنه‌مای گومان یان وادانان: *Some of the stages of the Earth's development are purely conjectural* ◌ حدسی، فرضی

**conjecturally** *adverb*
به مه‌زنده، به راوێژ ◌ حدساً

**conjecture** /kən'dʒektʃə(r)/ *noun*
1 وازانـین، وادانـان، مه‌زنـده، گـوتره، گومـان، بۆچـوون، راوێـژ 2 بنچینـه یـان تیـۆرێمێکی نه‌سه‌لمێنراوی زانستی یـان بیرکاری، دۆزێ (وه‌ک هی بیرکاری) به‌رله‌وه‌ی بسه‌لمێنرێ یا نا ◌ 1 حدس، فرض، ظن 2 کانتکتور

**conjoined twin** = Siamese twin

**conjoint** /kən'dʒɔɪnt/ *adjective*
1 یه‌ک‌گرتوو، هه‌ڤ‌گرتوو، united، conjoined 2 پێکه‌وه‌به‌ستراو، پێکـه‌وه، هاوبـه‌ش، پێکه‌وه‌گرێدراو ◌ 1 متحد 2 به‌هم‌پیوسته، مشترک

**conjointly** /kən'dʒɔɪntli/ *adverb*
پێکه‌وه، به‌یه‌که‌وه ◌ توأماً، مشترکاً

**conjugal** /'kɒndʒəgl. US 'kɑːn-/ *adjective*
سـه‌ربه هاوسـه‌رگیری یـان ژن‌ومێردایـه‌تی ◌ وابسته به زناشویی

**conjugality** /ˌkɑːndʒʊ'æləti/ *noun*
دۆخی ژن‌ومێردایه‌تی ◌ حالت زناشویی

**conjugally** /'kɒndʒəgli, US 'kɑːn-/ *adverb*
بـه رێگـای ژن‌ومێردایـه‌تی‌یـه‌وه ◌ بـه روش زناشویی

**conjugal rights** *noun, pl.*
مافی ژن‌ومێردایه‌تی ◌ حقوق زناشویی

**conjugate** /'kɒndʒʊgət/ *adjective, noun*
1 (زمانـه‌وانی) جـووت، هـاوره‌گ، هاوریشـه، هاوداڕشته، یه‌ک داڕشتنیان هه‌یه، خاوه‌نی داڕشتنی هاوبـه‌ش، common derivation، هـاوره‌گ و هاوواتا: *conjugate words* 2 جـووت، دووانه، پێکـه‌وه، پێکـه‌وه‌بـه‌سـتراو، coupled 3 (زینده‌ناسی، گامێته‌کان) پێکه‌وه‌نووساو، fused 4 هاونیر (*conjugately adv* ، conjugateness *n*) ◌ 1 مزدوج، متحدالاشتقاق 2 مـزدوج، تـوأم، پیوسته‌بهم 3 کانجیوگیت 4 هم‌یوغ

**conjugate protein** *noun*
پـرۆتینی هـاونیر: *hemoglobin is a conjugated protein* ◌ پروتئین هم‌یوغ

**conjugation** /ˌkɒndʒʊ'geɪʃn, US ˌkɑːndʒə-/ *noun*
1 گه‌ردان، گه‌ردان‌کردن، وردکردنه‌وه 2 هاونیری (لـه لاتینـه‌وه con - "هـاو"، پێکـه‌وه، jugum - "نیر")، جـووتی، جـووت‌گیری، جـووت‌گرتن 3 کـاره گـه‌ردان‌کراوه‌کـان (*conjugational adj*، *conjugationally adv*) ◌ 1 صـــرف 2 هم‌یوغی، گشن‌گیری 3 افعال تصریفی

**conjunct** /kən'dʒʌŋ(k)t/ *adjective*
1 *adj* یـه‌کگرتوو، یـه‌کخراو، پێکه‌وه‌به‌سـتراو، هاوبـه‌ش، united، conjoined: *conjunct influences* 2 (موسـیقا) سـه‌ربـه بـزاوت یـان جووڵه‌یێکی ئاواز نێوان نۆته لێک‌نزیکه‌کانی به‌یژه‌یێ 3 (ماف) ئه‌و خزم و که‌سانه ده‌گرێته‌وه که به‌هۆی نزیکایه‌تی ناتوانن به قازانج یان دژی که‌سێ گه‌واهی و شایه‌تی بده‌ن *n* 1 (رێزمان) پێکه‌وه‌به‌ستراوی: ناوه‌ڵکاری که دوو رسته یان کلـۆز پێـک ده‌به‌سـتێته‌وه (ب.ن. *however*) 2 شتێ که به شتێ یان به‌شێکی تر ده‌به‌سترێته‌وه (*conjunctly adv*) ◌ *adj* 1 متحد، مشترک 2 و 3 کونجانکت *n* 1 و 2 کونجانکت

**conjunction** /kən'dʒʌŋkʃn/ *noun*
1 (رێزمـان) پیـت یـان تیپـی پێوه‌نـدی، پیـتی پێکه‌وه‌به‌ست(ن) یـان بـه‌سـتنه‌وه، پیـتی لێکـده‌ر، وشـــــه‌لێکده‌ر (ب.ن. *or*، *but*، *if*، *and*) 2 یه‌کخـستن، دانـه‌دەم، تێـک‌هه‌ڵکێـشان، لێکـدان، یـه‌ک‌گـرتن، خـستنه‌سه‌ر، پێـک‌بـه‌سـتراوی، پێکه‌وبه‌ستراوی، پێـک‌به‌سـتی، پێوه‌سـت‌بـوون، combination: *working in conjunction with state and local authorities* 3 (ئه‌ستێره‌وانی) جووت‌بوون 4 هاوکاتی، هاوشوێنی (روودان یان رێکه‌وتن له یه‌ک کات و شوێن‌دا؛ *conjunctional adj*، *conjunctionally adv*) ◌ 1 حـرف ربـط 2 تلفیـق، اتـصال، پیوسـتگی 3 (اخترشناسی) قران 4 تزامن، تماکن

**conjunctiva** /ˌkɒndʒʌŋ(k)'taɪvə, US kən'dʒʌŋ(k)tɪvə/ *noun, pl.* conjunctivas or conjunctivae
(توێکـاری) کانجانکتیـڤا، پێـک‌بـه‌نـد، پێک‌به‌ست(ـه): په‌رده‌یێکی روون که ره‌قینه sclera (sclerotic) و شـاخینه‌ی cornea چـاو داده‌پۆشێ: په‌رده‌ی کیمی mucous membrane نێوه‌وه‌ی پێڵووی چاو ◌ ملتحمه

**conjunctival** *adjective*
سه‌ربه یان پێوه‌ندی به کانجانکتیڤاوه هه‌یه ◌ وابسته به ملتحمه

**conjunctive** /kən'dʒʌŋktɪv/ *adjective, noun*
*adj* (رێزمان) لێکده‌ر، پێکه‌وه‌به‌ست، به‌سته‌ر *n* پـــیتی پێوه‌نـــدی (conjunctively /kən'dʒʌŋktɪvli/ *adv*) ◌ *adj* رابط، عطفی *n* حرف ربط

**conjunctivitis** /kənˌdʒʌŋktɪ'vaɪtɪs/ *noun*
(پزشـکی) چاوێشه، هه‌ڵاوسـان یـا هـه‌وکـردنی conjunctiva ◌ ورم ملتحمه

**conjuncture** /kən'dʒʌŋkθʃə(r)/ *noun*

ویژدانی کار، بەئەرک‌زانی(ن)، شێلگیر، بەرشت، سەرراستی، دلسۆزی، بێ‌دەغەلی ◊ وظیفه‌شناسی، جدیت

**conscientious objection** *noun*
دژایەتی شەڕ، بەرهەلستایەتی لەگەل شەڕ، نارەزایی یان بەرهەلستی ویژدانی (~ لەبەر هۆی دینی یان ئاکاری moral نەچوونە نێو ریزی هێزە چەکدارەکان) ◊ مخالفت جنگ

**conscientious objector** *noun*
دژی شەڕ، دژبەر یان بەرهەلستی شەڕ، دژی توندوتیژی شەڕ ◊ مخالف جنگ، مخالف خشونت جنگی

**conscionable** /ˈkɒnʃɪenəbl/ *adjective*
ژیرانە، دروست، رەوا، conscientious ◊ معقول

**conscious** /ˈkɒnʃəs, US ˈkɑːn-/ *adjective*
1 هۆشیار، ئاگادار، خەبەردار، بەسەرنج، وریا، بەئاگا، خۆئاگا، وریا 2 بەمەبەست، ئەنقەست، خۆکردوو 3 بیریار، هزرمەند 4 هەستیار 5 شەرمێون، پەشۆکاو، تاساو ◊ 1 هشیار، متشعر، ملتفت، آگاه، خودآگاه 2 عمدی 3 متفکر 4 حساس 5 خجول، دستپارچه

**the conscious** /ˈkɒnʃəs, US ˈkɑːn-/ *noun*
هۆشیاری، هەست، خۆئاگاداری، خۆئاگایی ◊ خودآگاهی

**consciously** /ˈkɒnʃəsli, US ˈkɑːn-/ *adverb*
هۆشیارانە، ئاگادارانە، بەئەنقەست: *Consciously or unconsciously, you made a choice* ◊ آگاهانه، عمدی

**consciousness** /ˈkɒnʃəsnəs, US ˈkɑːn-/ *noun*
1 هۆشیاری، ئاگاداری، بەئاگایی، هۆش، خەبەر، خۆئاگایی، خۆئاگاداری، وریایی 2 ویژدان ◊ 1 هشیاری، خودآگاهی 2 وجدان، ضمیر

**consciousness-raising** *noun*
بردنەسەرەوەی (ئاستی) هۆشیاری یان ئاگاداری، رۆشنگەری: *a consciousness-raising group* ◊ ارتقاء آگاهی

**conscript** /ˈkɒnskrɪpt, US ˈkɑːn-/ *noun, adjective*
*n* سەرباز، بانگ‌کراو بۆ سەربازی *adj* خاوەنی شێوەی سەربازگیری (ئەرتەش) ◊ *n* مشمول، سرباز وظیفه *adj* کانسکریپت

**conscripted** *adjective*
بانگ‌کراو، نێوهاتوو (بۆ سەربازی) ◊ احضارشده

**conscription** /kənˈskrɪpʃn/ *noun*
خزمەت، رەش‌بگیری، سەربازگیری زۆرەکی، سەربازی، بانگ‌کراو بۆ سەربازی، نێوهاتوو بۆ سەربازی ◊ خدمت وظیفه، سربازی الزامی

**consecrated** *adjective*
1 پیرۆز، هەزەخ 2 تایبەت‌دراو، تەرخان‌کراو ◊ 1 متبرکه 2 اختصاص‌یافته

**consecration** /ˌkɒnsɪˈkreɪʃn, US ˌkɑːn-/ *noun*
1 تەرخان‌کردن، تەرخان‌کراوی، تایبەتی‌دان، تەرخان‌دان 2 پیرۆزی، پیرۆزاندن، ئاینی‌کردن 3 ئاهەنگ یان رێ‌ورەسمی دانان یان هەلبژاردن (قەشەی دەبێتە گەورەقەشە؛ consecrator *n* (consecratory *adj*) ◊ 1 وقف، تخصیص 2 تبرک، تقدیس 3 مراسم انتصاب، ارتسام

**consecrative** /kənˈsekjətɪv/ *adjective*, also **-cratory** /ˈkɒnsɪkrətəʊrɪ/
تەرخان‌دراو، تایبەت‌دراو، تەرخانە ◊ وقفی

**consecution** /ˌkɑːsəˈkjuːʃən/ *noun*
یەک‌لەدوای‌یەک‌هاتن، بەرودوایی، دوابەدوای‌یەک‌بوون، لەپشت‌سەریەک‌بوون، پەستایی، پەیتایی، زنجیرەیی ◊ توالی، تسلسل

**consecutive** /kənˈsekjətɪv/ *adjective*
دوابەدوای‌یەک، لەپشت‌سەریەک، یەک‌لەدوای‌یەک، لەپەستا، پەیتاپەیتا: *served four consecutive terms in office* ◊ متوالی، پشت سرهم

**consecutive lines** *noun, pl.*
هێلە دوابەدواکان یا بەرودواوکان ◊ خطوط متوالی

**consecutively** /kənˈsekjətɪvli/ *adverb*
بە شێوەیەکی دوابەدوای‌یەک، بەشێوەیەکی بەرودوا، لەپشت‌سەریەک، یەک‌لەدوای‌یەک، لەپەستا، پەیتاپەیتا: *The plays will be performed consecutively and will last eight hours* ◊ به طور متوالی، پی‌درپی

**consecutiveness** /kənˈsekjətɪvnəs/ *noun*
یەک‌لەدوای‌یەک‌هاتن، بەرودوایی، دوابەدوای‌یەک‌بوون، لەپشت‌سەریەک‌بوون ◊ توالی

**consensual** /kənˈsenʃuəl/ *adjective*
1 (ماف) بەپێی پێخۆش‌بوونی دوولایەنە: *a consensual contract* 2 (کارەندام‌ناسی) خۆنەویستە ◊ 1 مبنی بر رضایت دوطرفه 2 غیرارادی

**consensually** *adverb*
خۆنەویستانە ◊ به طور غیرارادی

**consensus** /kənˈsensəs/ *noun*
1 رێک‌کەوتن، یەک‌کەوتن، پێک‌هاتن، هاودەنگی، هاوبیری، قایل‌بوون، یەک‌رایی: *There is a growing consensus of opinion an attempt to reach a ◊ on this issue* 2 رەزامەندی، پێخۆش‌بوون 3 بۆچوون بەکۆمەڵ، بۆچوونی گشتی، رای زۆربە، بۆچوونی زۆرینە ◊ 1 توافق، اتفاق نظر 2 رضایت 3 اجماع، نظر اکثریت

**consent** /kənˈsent/ *noun*
1 رەزامەندی، پێخۆش‌بوون، قایل‌بوون، رازی‌بوون: *to refuse/withhold your consent*

2 ڕێک‌کەوتن، یەک‌کەوتن 3 ڕێدان، دەستوور، ڕێگەکردن، permission ◌ 1 رضایت 2 موافقت، توافق 3 اجازه

**consentaneity** *noun*, also -nsentaneousness
قایل‌بوون، ڕێک‌کەوتن، یەک‌کەوتن، سازان، ڕازیبوون، پێمل‌بوون، ڕالەسەربوون ◌ موافقت، مطابقت

**consentaneous** /ˌkɒnsen'teɪnɪəs/ *adjective*
ڕێک‌کەوتوو، یەک‌کەوتوو، ڕازی، قایل، ڕالەسەر، پێخۆش‌بوو ( consentaneously /ˌkɒnsen'teɪnɪəsli/ *adv*) ◌ موافق، مطابق

**consentient** /kən'senʃ(ə)nt/ *adjective*
(کۆن) ڕێک‌کەوتوو، یەک‌کەوتوو، ڕازی، پێمل، قایل، ڕالەسەر، پێخۆش‌بوو ◌ موافق، مطابق

**consenting** *adjective*
پێخۆش‌بوو، قایل، ڕازی، ڕالەسەر، ڕازیبوو، پێمل، بەردار ◌ راضی

**consenting adult** *noun*
مرۆڤی ژیر و پێگەیشتوو ◌ آدم عاقل و بالغ

**consequence** /'kɒnsɪkwəns, US 'kɑːnsəkwens/ *noun*
1 ئەنجام، ئاکام، پێناژۆ 2 گرنگایەتی 3 پلەوپایەی بەرز، پایەبەرزی 4 (consequences) دەرەنجامەکان، ئاکامەکان ◌ 1 پیامد، نتیجه 2 اهمیت 3 مقام رفیع 4 (در جمع) عواقب

**consequent** /'kɒnsɪkwənt/ *adjective, noun*
*adj* ئاکامی، ئەنجامی، لە ئەنجامی، لە ئاکامی، لێکەوتە لە، لێوەبوو، 1 *n* resultant (لۆژیک) ئەنجام، بەرەنجام، ئاکام، پێناژۆ 2 ئەنجامی سروشتی ◌ *adj* نتیجه‌ی، منتج از 1 *n* تالی، نتیجه 2 نتیجه‌ی طبیعی

**consequential** /ˌkɒnsɪ'kwenʃl, US ˌkɑːnsə'k-/ *adjective*
1 گرنگ، بەرکەفتی: *a grave and -equential event* 2 لەخۆبایی، خۆبەزل، گومڕا، خۆبەگرنگ 3 لە ئەنجامی، ئەنجامی، لێوەبوو ◌ 1 مهم 2 مغرور 3 منتج، ناشی از، منتج از

**consequentialism** *noun*
ئەنجامگەری، ئەنجامخوازی ◌ نتیجه‌گرایی

**consequentialist** *noun, adjective*
*n* ئەنجامگەر، ئەنجامخواز *adj* ئەنجامگەرییانە، سەربە یان پێوەندی بە ئەنجامگەرییەوە هەیە ◌ *n* نتیجه‌گرا *adj* نتیجه‌گرایانه

**consequentially** /-ʃəli/ *adverb*
لەخۆباییانە ◌ مغرورانه

**consequently** /'kɒnsɪkwəntli, US 'kɑːnsəkwentli/ *adverb*
لە ئەنجامدا، لە ئاکامدا، لەبەر ئەوە، جا کەوایە ◌ در نتیجه، بنابراین

**conservancy** /kən'sɜːvənsi, US -'sɜːrv-/ *noun, pl.* conservancies
1 پاراستنی ژینگەی سروشتی یان سەرچاوە سروشتییەکان، ژینگەپارێزی 2 ناوچەی پاراستن یا پارێزراو (ژینگە) 3 فەرمانبەرانی پاراستن، ژینگەپارێزان ◌ 1 حفاظت محیط طبیعی یا منابع طبیعی 2 منطقه‌ی حفاظت‌شده 3 مأموران حفاظت

**conservation** /ˌkɒnsə'veɪʃn, US ˌkɑːnsər'v-/ *noun*
1 پاراستن، ئاگالێبوون، ڕاگرتن، پاراستنی ژینگەی سروشتی یان سەرچاوە سروشتییەکان، ژینگەپارێزی: *to be interested in wildlife conservation* 2 (فیزیک) پاراستن، مانەوە: *energy conservation* 3 دەس‌پێوەگرتن، دەسگیرۆیی ◌ 1 حفاظت، حفظ، حفاظت محیط طبیعی یا منابع طبیعی 2 بقا، پایستگی، پایستاری (فیزیک) 3 صرفه‌جویی

**Conservation area** *noun*
ناوچەی پاراستن یان پارێزراو ◌ منطقه‌ی حفاظت‌شده

**conservation of charge** *noun*
پاراستنی بارگە، بارگەپارێزی ◌ بقای بار

**conservation of energy** *noun*
پاراستنی وزە، مانەوەی وزە، وزەپارێزی ◌ بقای انرژی

**conservation of mass** *noun*
پاراستنی قەبارە یان بارستە ◌ بقای جرم

**conservation of matter** *noun*
پاراستنی مادە یان کەرەسە، مادەپارێزی ◌ بقای ماده

**conservation of momentum** *noun*
پاراستنی بزەجوولە ◌ بقای اندازه‌ی حرکت

**conservation of orbital symmetry** *noun*
پاراستنی هاوتایی یا لێکچوویی خولگە (ئۆربیتاڵ) ◌ بقای تقارن اوربیتال

**conservationist** /ˌkɒnsə'veɪʃənɪst, US ˌkɑːnsər'v-/ *noun*
ژینگەپارێز، ژینگەوان، لایەنگری پاراستنی ژینگە، لایەنگری بزووتنەوەی سەوزەکان ◌ طرفدار حفاظت محیط زیست

**conservation law** *noun*
زاگۆن یان قانوونی پاراستن ◌ قانون بقا

**conservatism** /kən'sɜːvətɪzəm, US -'sɜːrv-/ *noun*
کۆنەپارێزی ◌ محافظه‌کاری

**Conservatism** /kən'sɜːvətɪzəm, US -'sɜːrv-/ *noun*
1 بنچینەکانی پارتی کۆنەپارێز لە سیاسەتی بریتانیادا 2 باوەڕ یان بۆچوونێکی سیاسی کە پێی‌وایە کۆمەڵگا دەبێ بە نەرمی بێتە گۆڕین ◌ کنسرواتیسم

**conservative** /kən'sɜːvətɪv, US -'sɜːrv-/

*adjective, noun*
*adj* 1 کۆنـــەپارێز، کۆنەپارێزانـــە: *the conservative views of his parents* 2 ئاسایی 3 (فیزیـــک) پـــارێزەر *n* مـــرۆی کۆنـــەپارێز، کۆنەپەرست ۞ *adj* محافظه‌کار، محافظه‌کارانـه 2 معمولی 3 پایـستار (فیزیک) *n* آدم محافظه‌کار

**Conservative** /kən'sɜ:vətɪv, US -'sɜ:rv-/ *adjective, noun*
*adj* سەربە پارتی کۆنەپارێزی بریتانیا: *-vative members/supporters* *n* ئەندام یان لایـەنگری پارتی کۆنەپارێزی بریتانیا ۞ کنسرواتیو

**conservatively** /kən'sɜ:vətɪvli, US -'sɜ:rv-/ *adverb*
کۆنەپارێزانە ۞ به طور محافظه‌کار

**Conservative Party** *noun*
(لە بریتانیا) پارتی کۆنەپارێز ۞ حزب محافظه‌کار

**conservatoire** /kən'sɜ:vətwɑ:(r), US -'sɜ:rv-/ *noun*
ئامۆژگای موسیقا و شـانۆ، هونەرستانی موسـیقا یـان شـانۆ، قوتـابخانـە یـان کـۆلێژی موسـیقا و شانۆ ۞ هنرکده‌ی موسیقی

**conservator** /kən'sɜ:vətə(r), US -'sɜ:rv-/ *noun*
پارێزەر، نۆبەدار، ئاگادێر ۞ حافظ، نگهبان

**conservatorium** /kən,sə:və'tɔ:rɪəm/ *noun, pl.* conservatoriums or conservatoria = Australian term for conservatoire

**conservatory** /kən'sɜ:vətri, US -'sɜ:rvətɔ:ri/ *noun*, also conservatoire, *pl.* conservatories
1 گوڵخانە، گەرمخانە، شـێنگەی شووشـەیی 2 (زۆرتـــر لـــە ئـــەمریکـــا (ی بـــاکووری) = conservatoire ۞ گل‌خانه

**conserve** /'kɒnsɜ:v, US 'kɑ:nsɜ:rv/ *noun*
مرەبا، خۆشاو، کەمپوت، jam ۞ مربا، کمپوت

**considerable** /kən'sɪdərəbl/ *adjective, noun*
*adj* 1 گرنـگ، بـەرچاو، شـیاوی بایـەخپێـدان، بەبایەخ، شایانی تێبینی، جێی سەرنج: *Damage to the building was considerable* 2 زۆر و زەبەن، گەلێ، زۆر، گەورە *n* رادە، ئەندازە یا بڕێ بەرچاو ۞ *adj* 1 قابـل ملاحظـه، مهـم 2 عمـده، بسیار، بزرگ *n* حد یا مقدار قابل ملاحظه

**considerably** /kən'sɪdərəbli/ *adverb*
بە شێوەیەکی بەرچاو، زۆر؛ گـەلێک ۞ بـه طـور قابل ملاحظه‌ای؛ بسیار

**considerate** /kən'sɪdərət/ *adjective*
تێـبین، بەسـەرنج، دڵـی خەڵـک رادەگـری، لـە رووی ســـەرنجەوە، نیـــشانەی ســـەرنج (considerateness *n*) circumspect ۞ باملاحظه، از روی ملاحظه

**considerately** /kən'sɪdərətli/ *adverb*
لە رووی تێبینی یان سەرنجەوە: *She drives carefully and -siderately* ۞ از روی ملاحظه

**consideration** /kən,sɪdə'reɪʃn/ *noun*
1 سـەرنج، تێبـینی، بـال، بایـەخ، وردبوونـەوە، خوردبوونەوە، تێرامان، قووڵبوونەوە، تێڕوانین، بیرکردنـەوە، سـەرنجپێـدان، رەچـاوکردن، بایەخپێدان، بەهێندگرتن، راگرتنی دڵـی خەڵـک، بەتەنگـەوەبوون، پـەیجوری، لێکدانـەوە، لێکۆڵینەوە: *after long consideration he agreed to their requests* 2 پرس، بابەت، مژار 3 هۆ، بەڵگە 4 پاداشت، دەسخۆشانە 5 پارە 6 گرنگایـەتی (زاراوە و ئیدیۆمـەکـان: in consideration of: لەبەر، بەهۆی، بە خـاتری، لە چاکەی، لە یان بە پاداشتی: *a small sum in consideration of your services* ◊ on no consideration: بە هیچ شێوەیێ، قەت، هەرگیز، بـە هـیچ کلۆجـێ ◊ under consideration: خـەریکـە لێکۆڵـینەوەی لـێ دەکـرێ، لـەژێـر لێکۆڵـینەوەدا ◊ worthy of consideration: شـایانی سـەرنج پێدان یـان وردبوونـەوە) ۞ 1 توجه، دقت، مشاهده، مداقه، ملاحظه، اندیشه، اعتنا، رعایت، بررسی 2 مسأله، موضوع 3 دلیـل، علـت 4 پاداش 5 پول 6 اهمیت

**considered** *adjective*
لێکۆڵـراو، لێکـەوەدراو، لێکۆڵینەوەلەسـەرکراو، جێـی سـەرنج، شـیاوی سـەرنج، گرنـگ: *a considered opinion* ۞ بررسی‌شده، مهم

**considering** /kən'sɪdərɪŋ/ *preposition, conjunction, adverb*
بە سەرنجدان بەو شتە، بە رەچاوکردنی، ئەگەر هەموو شتێ لێک بدەینەوە، چونکە، لەچاو: *he did well considering his limitations* ◊ *considering he was new at the job, he did quite well* ۞ با توجه به این‌که، نظر به

**consignee** /,kɒnsaɪ'ni:/ *noun*
وەرگر، بۆنێردراو ۞ دریافت‌کننده

**consignment** /kən'saɪnmənt/ *noun*
1 بار، کەلوپەل، ناردەمەنی: *a consignment of medicines* 2 ناردن، بەڕێکردن، هەناردن ۞ 1 محموله 2 ارسال

**consignment note** *noun*
بارنامە، تێبینی ناردن ۞ بارنامه

**consigner** *noun*, also consignor
نێرەر، بارنێر، بەڕێکەر، هەنێر ۞ فرستنده

**consistency** /kən'sɪstənsi/ *noun, pl,* consistencies, also consistence /kən'sɪstəns/
1 سازان، گونجان، یەکگرتنەوە، یەککەوتن، رێککەوتن، یەکڕەنگی، هاورێکی، یەکانگیری 2 بـەردەوامبـوون، یەکبینـەیی، لەسەرڕۆیـشتن، درێژەدان، چەسپیوی، جێگیری، سەقامگیری،

خۆڕاگری، پتەوی، تۆکمەیی، خۆگری، نەگۆڕی 3 پێوەندی لۆژیکی 4 خەستی، پەیتی، توندی ◇ 1 سازگاری، توافق، هماهنگی، انسجام، همخوانی 2 تداوم، ثبات، قوام، استحکام 3 ارتباط منطقی 4 غلظت

**consistent** /kən'sɪstənt/ *adjective*
1 سازاو، گونجاو، یەکانگیر، یەکگرەوە، جۆر، یەککەوتوو، یەکڕەنگ، هاوڕێک، یەکجۆر، پتەو، تۆکمە، سەقامگیر، چەسپیو، ڕەگداکوتاو، جێگیر، خۆگرتوو، توندوتۆڵ: *a -istent patriot* 2 لۆژیکی، ژیرانە 3 هەمیشەیی، یەکبینە، بەردەوام ◇ 1 سازگار، هماهنگ، منسجم، منطبق، استوار، محکم، باثبات 2 منطقی 3 ثابت، دائمی

**consistently** /kən'sɪstəntli/ *adverb*
هەمیشە، یەکبینە ◇ متداوماً، همواره

**consistorial** /ˌkɒnsɪ'stɔːrɪəl/ *adjective*
1 سەربە کۆڕ یان ئەنجومەنی کاردینالەکان (بەبێ پاپ) 2 سەربە دەستەی بەڕێوەبەرایەتی خۆجێیی ◇ 1 وابسته به مجمع کاردینال 2 وابسته به هیأت اداری محلی

**consistory** /kən'sɪst(ə)ri/ *noun, pl.* consistories
1 دانیشتن، کۆبوونەوە 2 کۆڕ یان ئەنجومەنی کاردینالەکان (بەبێ پاپ) 3 دادگای کلێسە؛ کۆڕ یا کۆمەڵەی پیاوانی دینی 4 (لە کلێسەکانی ترا) دەستەی بەڕێوەبەرایەتی خۆجێیی ◇ 1 جلسه 2 مجمع کاردینال، شورای کاردینالها 3 دادگاه کلیسا؛ انجمن روحانیان یا کاتوزیان 4 هیأت اداری محلی

**consociation** *noun*
1 یەکگرتن، یەکیتی، یەکگرتوویی 2 یەکیتی کلێسەکان ◇ 1 اتحاد 2 اتحاد کلیساها

**consolable** *adjective*
دڵخۆشی دەدرێتەوە ◇ تسلی‌پذیر

**consolation** /ˌkɒnsə'leɪʃn, US ˌkɑːn-/ *noun*
دڵدانەوە، دڵنەوایی، دڵخۆشیدانەوە، دڵگەرمی(دانەوە)، مایەی دڵدانەوە، دڵخۆشکەر، خەمڕەوێن: ◊ *a few words of consolation* ◇ *At least you weren't hurt—that's one consolation* ◇ تسلی، دلداری، مایه‌ی تسلی

**consolation prize** *noun*
خەڵاتی دڵدانەوە ◇ جایزه‌ی تسلی

**consolatory** /kən'sɒlətəri, US kən'soʊlətɔːri, -'sɑːlə-/ *adjective*
دڵخۆشیدەرەوە، دڵنەواییدەرەوە، دڵدەرەوە، خەمڕەوێن، دڵخۆشکەر، دڵگەرمکەر ◇ تسلی‌بخش

**console** /'kɒnsəʊl, US 'kɑːnsoʊl/ *noun*
1 مێزی فەرمان، تەختی فەرمان، تەخت یان مێزی کۆنترۆڵ 2 دۆڵاب، سندووق، مێز (تەلەفزیۆن، کامپیوتر، ڤیدیۆ و هتد) 3 ڕەفحەی جوانی، پایەی سێ‌گۆشە ◇ 1 صفحه فرمان 2 میز 3 رف تزئینی

**console table** *noun*
مێزی دیواری ◇ کانسول تیبل

**consolidant** /kən'sɒlɪdənt/ *adjective*
پتەوکەر، تۆکمێنەر، بەهێزکەر ◇ تحکیم‌کننده

**consolidated** *adjective*
1 یەکخراو، یەکگرتوو 2 تێکهەڵکێشراو 3 هاوبەش ◇ 1 متحد 2 ادغام‌شده 3 مشترک

**consolidated annuities** = consols

**consolidation** /kənˌsɒlɪ'deɪʃn, US -ˌsɑːl-/ *noun*
1 پتەوی، تۆکمەیی، داکوتان، چەسپاندن، بەهێزکردن، پێزداری، جێگیرکردن، تۆکماندن، پتەواندن، سەقامگیرکردن، توندکردن 2 لێکدان، یەکخستن، تێکخستن، تێکهەڵکێشان، کردنەیەک، یەکگرتن، بوونەیەک، یەکبوون ◇ 1 استحکام، تحکیم، تثبیت 2 ادغام، ترکیب، اتحاد

**consoling** *adjective*
دڵخۆشیدەرەوە، خەمڕەوێن، دڵدەرەوە، دڵخۆشکەر، دڵگەرمکەر ◇ تسلی‌بخش

**consolingly** *adverb*
خەمڕەوێنانە، دڵخۆشکەرانە، دڵگەرمکەرانە ◇ به طور تسلی‌بخش

**consols** /'kɒns(ə)lz/ *noun, pl.,* also Consols
قەرزە گشتییەکان، قەباڵە و سەنەدی قەرزی حکومەتی بریتانیا (بێ ڕێکەوتی دانەوە و بە سوودی ساڵانەی چەسپیوە یان دیاریکراوەوە؛ بنەڕەت: کورتەی *consolidated annuities*) ◇ اوراق دیون (دولت بریتانیا)

**consommé** /kən'sɒmeɪ, US ˌkɑːnsə'meɪ/ *noun*
سوپی تراو، شلپێتاو، ئاوگۆشتی بێ‌مایە ◇ کنسومه

**consonance** /'kɒnsənəns, US 'kɑːn-/ *noun*
1 ڕێککەوتن، سازان، یەکگرتنەوە، تەبایی، کۆکی، گونجان، هاودەنگی، هاوئاوازی 2 تێکەڵاییەتی هارمۆنیکی نۆتەکان ◇ 1 سازگاری، همخوانی، هماهنگی 2 کونسونانس

**consonant** /'kɒnsənənt, US 'kɑːn-/ *noun, adjective*
*n* 1 (زمانەوانی) نەبزوێن (وەک /n/ /g/ /p/ /l/ /s/ /r/) 2 پیتی بێدەنگ یان کپ *adj* (لەگەڵ with یان to) ڕێککەوتوو، کۆک، هاودەنگ، گونجاو، شیاو ◇ *n* 1 همخوان 2 حرف بی‌صدا یا صامت *adj* موافق، متناسب

**consonantal** /ˌkɒnsə'næntl, US ˌkɑːn-/ *adjective*
1 سەربە پیتی کپ یان بێدەنگ 2 نەبزوێنی، سەربە نەبزوێن یان کۆمەڵێ لە نەبزوێنەکان ◇ 1 وابسته به حرف صامت 2 همخوانی

**consonant cluster** *noun*
هێشووی نەبزوێنەکان: زنجیرەیێکی دوو یان چەند نەبزوێن لە سەرەتای بڕگە (وەک لە وشەی /splæʃ/ *splash*) یان لە کۆتایی بڕگەدا (وەک /sts/ لە *tests* دا) ◌ خوشەی همخوانها

**consonantly** /ˈkɒnsənəntli, US ˈkɑːn-/ *adverb*
هاودەنگانە، بە شێوەیێکی هاودەنگ ◌ بە طور هماهنگ

**consonant shift** *noun*
گۆڕانی نەبزوێن (لە مێژووی زمان یان زاراوەیێ، ئەو گۆڕانانە بووە هۆی جیاوازی نەڵمانی لە زمانەکانی تری هێند و ئەورووپی) ◌ تغییر همخوان

**consort**[1] /ˈkɒnsɔːt, US ˈkɑːnsɔːrt/ *noun*
1 هاوسەر (پادشا یان شاژن) 2 ژن، مێرد، هاوملّ 3 کەشتی هاوڕێ یان لەگەڵ، کەشتی هاوسەفەر ◌ 1 همسر 2 زوجه، زوج 3 کشتی همراه

**consort**[2] /ˈkɒnsɔːt/ *noun*
دەستەیەیێکی چکۆڵەی موسیقاژەنەکان پێکەوە، زۆرتر بۆ لێدانی موسیقای Renaissance ◌ کونسورت

**consortium** /kənˈsɔːtiəm, US -ˈsɔːrt-/ *noun, pl.* consortia /-tɪə/ or consortiums
1 هاوبەشداری، پێکەوەکاری، یەکگرتوویی دارایی (چەند کۆمپانی، بانک و هتد) 2 کۆمەڵ ◌ 1 کنسرسیوم 2 جمعیت

**conspecific** /kɒnspəˈsɪfɪk/ *noun, adjective*
(زیندەناسی) *n* هاوجۆر، هاوچەشن *adj* ئەندامی هاوجۆر یان هاوچەشن ◌ *n* همنوع، همگونە *adj* عضو همنوع

**conspecificity** *noun*
هاوجۆری، هاوچەشنی ◌ همنوعی، همگونگی

**conspectus** /kənˈspektəs/ *noun*
1 کورتە، پوختە 2 چاوپیاگێڕانی گشتی، سەردان یان چاوپیاخشاندنی بەگشتی ◌ 1 خلاصە، چکیدە 2 بازدید عمومی

**conspicuity** /ˌkənspɪˈkjuːətɪ/ *noun*
دیاربوون، بەرچاوی، روونی، ئاشکرایی، بەرجەستەیی، conspicuousness ◌ وضوح، مشخص بودن

**conspicuous** /kənˈspɪkjuəs/ *adjective*
ناسراو، بەناوبانگ، دیار، بەرجەستە، روون، ئاشکرا، راشکاو، خۆیا، بەرچاو، زەق ◌ مشهور، هویدا، معلوم، مشخص، واضح، چشمگیر، فاحش

**conspicuous consumption** *noun*
دەسبڵاوی خۆپیشاندەرانە یان خۆنوێنەرانە، بەکارهێنان یان دەسبڵاوی بۆ خۆنواندن، مەسرەفی بۆ خۆنواندن، مەسرەفی خۆپیشاندەرانە یان خۆنوێنەرانە ◌ مصرف متظاهرانە

**conspicuously** /kənˈspɪkjuəsli/ *adverb*
بە شێوەیێکی دیار، بەرچاوانە، بە شێوەیێکی بەرچاو ◌ بە طور مشخص

**conspiracist** *noun*
لایەنگری تیۆری پیلان ◌ طرفدار نظریەی توطئە

**conspiracy** /kənˈspɪrəsi/ *noun, pl.* conspiracies
1 پیلان، سازوباز، کۆمپلۆ، کەینوبەین، هاودەستی، گەلەکۆمە: *a conspiracy to conspiracies* ◊ *overthrow the government* 2 هاوکاتی *against the president* ◌ 1 توطئە، دسیسە، تبانی 2 تقارن

**conspiracy of silence** *noun*
پیلانی بێدەنگی ◌ توطئەی سکوت

**conspiracy theory** *noun*
تیۆری پیلان (= باوەڕێ کە پیلانێکی نهێنی بەرپرسە بۆ رووداوێکی تایبەتی) ◌ تئوری توطئە

**conspirator** /kənˈspɪrətə(r)/ *noun,* also conspirer
پیلانگێڕ، بەشدار لە پیلاندا ◌ توطئەگر

**conspiratorial** /kənˌspɪrəˈtɔːriəl/ *adjective*
پیلانگێڕییانە، پیلانگێڕانە ◌ توطئەآمیز

**conspiratorially** /kənˌspɪrəˈtɔːriəli/ *adverb*
بە شێوەیەکی پیلانگێڕییانە ◌ بە طور توطئەآمیز

**constable** /ˈkʌnstəbl, US ˈkɑːn-/ *noun*
1 = police constable 2 ئەفسەری پۆلیس 3 فەرمانداری قەڵای پاتشایی 4 (مێژوویی) پایەبەرزترین کاربەدەست لە ماڵی پاتشادا ◌ 1 = police constable 2 افسر پلیس 3 کوتوال 4 کونستابل

**constabulary** /kənˈstæbjələri, US -leri/ *noun, pl.* constabularies
پۆلیس، هێزی پۆلیس (ناوچە یان شارێ) ◌ پلیس، نیروی پلیس

**constancy** /ˈkɒnstənsi, US ˈkɑːn-/ *noun*
1 جێگیری، خۆگرتن، سەقامگرتوویی، چەقبەستوویی، بنگرتن، راگیری، چەسپیوی، نەگۆڕی، داکوتراوی، بەردەوامی، لەسەرڕۆیشتوویی 2 یەکلایی، یەکڕوویی، وەفاداری، بەئەمەکی، پێزانی، یەکڕەنگی، دڵسۆزی ◌ 1 ثبات، پایداری، تداوم 2 وفاداری

**constancy phenomenon** *noun*
دیاردەی جێگیری یا چەسپیوی ◌ پدیدەی ثبات

**constancy principle** *noun*
بنچینە یان بنەمای جێگیری ◌ اصل ثبات

**constant** /ˈkɒnstənt, US ˈkɑːn-/ *adjective, noun*
*adj* 1 جێگیر، خۆگرتوو، چەسپیو، نەگۆڕ، بنگر، چەقیو، سەقامگیر، سەقامگرتوو، نەگۆڕ 2 بەردەوام، یەکبینە، هەمیشەیی، لەسەریەک،

یەکـریز 3 وەفـادار، بـەوەفا، بەئەمـەگ، یـەکلا، یەکرەوو، یەکـرەنگ، دڵـسۆز *n* شتی جێگیر و نـەگۆڕ 2 بـڕ یـان ژمارەیـەکی جـێگیر ◌ *adj* 1 ثابت، پایدار 2 دائم، مدام 3 وفادار *n* 1 شیء ثابـت و بدون متغیر 2 مقدار یا عدد ثابت

**constantan** /ˈkɒnst(ə)ntan/ *noun*
دارشتەی مس و نیکل: لە کاروباری برق، بۆ بەرگری زۆری ◌ کونستانتان

**constant error** *noun*
هەڵەی بەردەوام ◌ خطای پایدار

**constant factors** *noun, pl.*
هۆکارە بەردەوامەکان ◌ عوامل پایدار

**constantly** /ˈkɒnstəntli, US ˈkɑːn-/ *adverb*
یەکبینە، لەسـەریەک، هەمیشـە ◌ دائماً، پیوسته

**constative** /ˈkɒnstətɪv, US kənˈsteɪtɪv/ *adjective, noun*
*adj* (زمانـەوانی) ڕاگەیێنـەری، ئاگـاداری‌یانـە *n* ڕستەی ڕاگەیێنـەری ◌ *adj* اظهـاری *n* جملـەی اظهاری

**constellation** /ˌkɒnstəˈleɪʃn, US ˌkɑːn-/ *noun*
1 گەلەسـتێرە، کـەلوو، بـرج، ئـەسـتێرەگـەل، کۆئەستێرە: *The Little Bear constellation is still used by navigators at sea* 2 کۆمەڵـە، گـروپ، دەسـتە (خـەڵـک یـا شـت: *a constellation of Hollywood talent*)؛ بنـەڕەت: بـە ڕێگـای فـەرەنـسی کـۆن لـە late Latin *constellatio(n-)* لەسـەر بنچینـەی *stella* لاتـین "ئـەسـتێرە star") ◌ 1 صـورت فلکی، برج، مجمع‌الکواکب 2 مجموعه، گروه

**constellatory** /kənˈstelətɔːrɪ/ *adjective*
گەلەستێرەیی، کۆئەستێرەیی، کـەلوویی ◌ وابسـته به صورت فلکی

**consternation** /ˌkɒnstəˈneɪʃn, US ˌkɑːnstərˈn-/ *noun*
1 سەرسـووڕمان، پەشـۆکان، سەرسـامی، عەبەسران، حەپەسان، واقوڕمان، واق‌مان، ترس، تۆقان 2 نگەرانی، دڵەتەپێ ◌ 1 حیرت، شگفتی، وحشت 2 نگرانی

**constipated** /ˈkɒnstɪpeɪtɪd, US ˈkɑːn-/ *adjective*
قەبز، گیر، زگگیر، نارەوان، سکگیر ◌ یُبس

**constipating** *adjective*
قەبزکەر، مایەگیر، بەگیر، گیرێنە ◌ قابض

**constipation** /ˌkɒnstɪˈpeɪʃn, US ˌkɑːn-/ *noun*
قـەبز، سـکگـیری، زگگـیری، گـیری، گـیران، گرفت ◌ قبض، یبوست

**constituency** /kənˈstɪtjuənsi, US -tʃu-/ *noun, pl.* constituencies
1 مەڵـبەندی هەڵـبژاردن 2 دەنگـدەران، هەڵـبژێران: *constituency opinion* ◌ 1 حوزەی انتخاباتی 2 رأی‌دهندگان

**constituent** /kənˈstɪtjuənt, US -tʃu-/ *noun, adjective*
*n* 1 دەنگـدەر 2 پێکهێنـەر، بەشـی پێکهێنـەر، سازێنە، سـازا، بەشـی بنـەڕەتی، ڕەگـەز، تـوخم، بەشی سەرەکی 3 ئەندامی مەڵبەندی هەڵبژاردن *adj* 1 دامەزرێنەر، سازەر، پێکهێنـەر، بنیاتنـەر 2 دەنگدەر، هەڵبژێر 3 خاوەنی مافی هەڵبژاردن ◌ *n* 1 رأی‌دهنده 2 مؤلفه، عنصر، جزء سـازنده 3 عـضو حـوزەی انتخابـاتی *adj* 1 تـشکیل‌دهنـده، مؤسـس 2 انتخاب‌کننده 3 دارای حق انتخاب

**constituent assembly** *noun*
ئەنجومـەنی دامەزرێنـەران یـان قـانوون‌دانـان، ئەنجومەنی گۆڕینی دەستوور ◌ مجلس خبرگان

**constitution** /ˌkɒnstɪˈtjuːʃn, US ˌkɑːnstəˈtuːʃn/ *noun*
1 قـانوونی بنچینـەیی (یـا بنـەڕەتی)، دەسـتوور: *your right to vote under the constitution* 2 پێکهـاتن، دروس‌بـوون، پێکهاتـە، دامـەزران، دارێـژران 3 دامەزرانـدن، بنیاتنـان، دروس‌کـردن، پێکهێنـان، سـازاندن، دارشـتن 4 سرشـت، نیـار 5 پێکهاتە یان چوارچێوەی لەشی، بنگـە، داروبـار: *to have a healthy constitution* 6 قـانوون، یاسـا، زاکـوون، قەباڵـە ◌ 1 قـانون اساسـی 2 ساخت، ترکیب، تشکل 3 تأسیس، تشکیل 4 نهاد 5 بنیه 6 قانون، سند

**constitutional** /ˌkɒnstɪˈtjuːʃənl, US ˌkɑːnstəˈtuː-/ *adjective*
1 بـەپێی قـانوونی بنچینـەیی یـان دەسـتوور، دەسـتوورانە، دەسـتوورمەند، دەسـتووری: *a constitutional government* 2 سـەربە قانوونی بنچینەیی 3 قانوونی، یاسایی 4 سەربە پێکهاتـەی لەشی، بنگەیی ◌ 1 مطابق قانون اساسی، مشروطه 2 وابسته به قانون اساسی 3 قانونی 4 وابسـته به بنیه

**constitutionalism** /ˌkɒnstɪˈtjuːʃənəlɪzəm, US ˌkɑːnstəˈtuː-/ *noun*
دەسـتووریاوەڕی ◌ مـشروطەگرایـی، مشروطەخواهی، مشروطیت

**constitutionalist** /ˌkɒnstɪˈtjuːʃənəlɪst, US ˌkɑːnstəˈtuː-/ *noun*
دەستووریاوەڕ ◌ مشروطەگرا، مشروطەخواه

**constitutionality** /ˌkɒnstɪˌtjuːʃəˈnæləti, US ˌkɑːnstəˌtuː-/ *noun*
دەسـتوورایەتی، بـەپێی دەسـتوور بـوون، دەسـتوورمەندی: *questioned the constitutionality of the law* ◌ مطابق قـانون اساسی بودن

**constitutionally** /-ʃənəli/ *adverb*
لەباری دەستوور یان قـانوونی بنچینـەیی‌یەوە ◌ از نظر قانون اساسی

**constitutional monarch** *noun*
پادشای دەستووری یان دەستوورمەند ◌ پادشاه مشروطه

**constitutional monarchy** *noun*
پادشـایەتی دەسـتووری یـان دەسـتوورمەند ◌ سلطنت مشروطه

**constitutive** /ˌkɒnstɪˈtjuːtɪv, US ˌkɑːnstəˈtuːtɪv/ *adjective*
1 دامەزرێنەرانـە، پێکهێنەرانـە، بنیاتنەرانـە 2 بنیاتنەر، دامەزرێنەر، constituent 3 سـەرەکی، بنـەڕەتی، بنگـەهی، پێویـست، essential: *Poverty is a -stitutive element of a particular form of economic growth* constitutively /ˌkɒnstɪˈtjuːtɪvli, US ˌkɑːnstəˈtuːtɪvli/ *adv*) ◌ 1 تأسیـسی 2 تشکیل‌دهنده 3 اصلی، اساسی، ضروری

**constrained** /kənˈstreɪnd/ *adjective*
(فەرمی) 1 زۆرلێ‌کراو، زۆری، زۆرەکی، بەزۆر، ناچـار، داسـەپاو، پێبەنـد، جـڵەوگیراو، بەسـت، دەربەنـد، دەربەسـت 2 تاسـاو، پەشـۆکاو 3 درۆ، ناسروشتی، ساختە: *constrained emotions* ◌ 1 مجبور، مقید، ملزم 2 مبهوت 3 غیرطبیعی

**constrainedly** /kənˈstreɪndli/ *adverb*
بـەزۆری، بـەناچار، بـە شـێوەیێکـی سـاختە ◌ اجباراً، به طرز مصنوعی

**constraint** /kənˈstreɪnt/ *noun*
1 زۆرلێ‌کردن، زۆرەملی، ناچارکردن، پێکردن، هەڵپێچان، سەنگی، زۆری، گوشار 2 کۆت‌وبەند، کۆت‌وزنجیر، گیروبەند، بەرتەسکی، بەرتـەنگی، بەربەست، کۆسپ، لەمپەر 3 پەشۆکاوی، تاساوی 4 سـەرکوت(کـردن)، داپـڵۆساندن، خەفـەکردن، کپانـدن (سـۆز) 5 گـڵدانـەوە، بەسـتنەوە، دەس‌بەسەرکردن ◌ 1 اجبار، الزام، زور 2 قیـد و بند، مانع 3 بهت‌زدگی 4 سرکوبی 5 توقیف

**constricted** /kənˈstrɪktɪd/ *adjective*
1 بەرتـەنگ، بەرتەسـک، قـەتیس، دیـاریکـراو، گیراو، بەسـتراو: *a constricted vision of the world* 2 تەنگ، تەسک ◌ 1 محدود 2 ضیّق

**constricting** *adjective*
دیاریکراو، بەرتەسک، گیراو، بەستراو ◌ بسته، محدود

**constriction** /kənˈstrɪkʃn/ *noun*
1 بەرتـەنگی، سـنوورداری، بەرتەسـکی، بەنـد: *political constrictions* 2 کرژبـوون، کۆبوونەوە، تەنگ‌بوونەوە، تەنگاندن، هەڵقرچان، قرچ‌هەڵاتن، پێچرانەوە، وێکهاتن، چوونەیەک 3 ئەندامی کووەبوو یان هەڵقرچاو ◌ 1 محدودیت 2 انقباض 3 عضو منقبض‌شده

**constrictive** /kənˈstrɪktɪv/ *adjective*
کرژێنـەر، تەنگێنـەر، هەڵـقرچێنەر، وێکهێنـەر ◌ فشارآور

**constrictor** *noun*
1 (توێکـاری) ماسـوولکەی کرژکـەرەوە یـان تەنگێنەر، کرژەماسوولکە 2 ماری پێچەرەوە یان تێ‌ئالاو، مارێ کە لە نەچیر دەئاڵـێ و دەیکوژێ (وەک boa یان python) ◌ 1 عضلەی قابضە 2 اژدرمار

**constringent** /kənˈstrɪndʒənt/ *adjective*
کرژێنـەر، هەڵـقرچێنەر، تەنگێنـەر، وێکهێنـەر، گوشاردەر ◌ قابض

**construct** /ˈkɒnstrʌkt, US ˈkɑːn-/ *noun*
1 چەمک، بیر، بیرۆکە، ئایدیا، ئیدە، تیۆری 2 پێکهێنان 3 (زمانەوانی) گرووپێ لە وشەکان کە دەستەوشـە یـان لارسـتەیێ پێکـدێنن، ڕۆنـان 4 پێکهاتە، سازە (شتێ کە ساز بووە) 5 بەرهەم (ی ئایدیۆلۆژی، مێژوو یا بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی social circumstances) ◌ 1 مفهـوم، ایـده، نظریە 2 ساخت 3 و 4 کونستراکت 4 محصول

**construction** /kənˈstrʌkʃn/ *noun*
1 دروستکـردن، دانـان، سـازکردن، بنیـات‌نـان، پێکـەوەنان، دامەزرانـدن، سـازاندن، خانووبـەرە، خـانوو، مـاڵ، بینـا، دەزگـا 2 پێکهێنـان، پێکهاتـە: *ships of steel construction* 3 ڕاڤە، لێکدانـەوە، بۆچـوون، interpretation 4 واتـا 5 (ڕێزمـان) لێکدان، ڕێکخـستن، دارشـتن: *grammatical constructions* 6 گـۆڕان ◌ 1 احداث، سـاختن، ساختمان 2 ساخت، سـاختار 3 تعبیـر، برداشـت 4 معنا 5 (دستور زبان) ترکیب، آرایش 6 تغییر

**constructional** /kənˈstrʌkʃənl/ *adjective*
پێکهێنەرانـە، پێکهاتـەیی، دروسـت‌کەرانـە، سـازێنەرانە، بنیاتنەرانـە: *constructional toys* (constructionally *adv*) ◌ ساختاری، ساختی

**constructionist** *noun*
لێکـدەرەوە، شـیکـەرەوە (ب.ت. قـانوون) ◌ مفسر، شارح

**construction paper** *noun*
کاغەزێکی ڕەنگینی ئەستوور کە بۆ دیزاین و نەخشە و مودێل بەکاری دێنن ◌ نوعی کاغذ

**constructive** /kənˈstrʌktɪv/ *adjective*
1 دروس‌کەر، سازنە، بەسـوود، بەبەهـرە، بەجێ، بـەقازانج، ڕچەشـکێن، بنیـاتنـەر، بـەکارهاتوو، یاریـدەدەر (وەکـوو ڕەخنـە): *constructive criticism/suggestions/advice* ◊ *The government is encouraging all parties to play a constructive role in the reform process* 2 پێکهێنەرانـــە، پێکهاتـــەیی 3 لێکدەرەوانـە، شـیکردنـەوەیی، لێکدانـەوەیی، ڕاڤەیی 4 بەڵـگەهێنانەوەیی 5 ئەنجامگیری‌یانە، ناڕاستەوخۆ، لە بنەوە ◌ 1 سـازندە، سـودمند 2 ساختاری 3 تعبیری 4 استدلالی 5 استنتاجی، ضمنی

**constructive criticism** *noun*
ڕەخنەی دروس‌کەر یان بەسوود یان بنیات‌نەر

۞ نقد سازنده

**constructively** /kən'strʌktɪvli/ *adverb*
بەشێوەیەکی بەسوود یان بەکارهاتوو، بنیاتنەرانە: *Use your time constructively* ۞ به نحو سازندەای

**constructor** /kən'strʌktə(r)/ *noun*
1 دروسکەر، سازێنەر (کەس یان کۆمپانیا، ب.ت. فرۆکە و ماشێن) 2 (لە لێکدانا) ــ دروسکەر، ــساز ۞ 1 سازنده 2 (در ترکیب) ــساز

**consubstantial** /ˌkɒnsəb'stænʃəl/ *adjective*
(ب.ت. دەربارەی ئەو سێ کەسەی ترینیتی لە یەزدانناسی کریستیەنا) هاوکرۆک، هاوگەوهەر، هاوخۆرسک، هاوسروشت ۞ هم‌ذات

**consubstantiality** /ˌkɒnsəbˌstænʃɪ'ælɪtɪ/ *noun*
هاوکرۆکی، هاوسروشتی، هاوگەوهەری ۞ هم‌ذاتی

**consubstantiation**
/ˌkɒnsəbstanʃɪ'eɪʃ(ə)n, US -sɪ-/ *noun*
1 هاوکرۆکی، هاوگەوهەری 2 (یەزدانناسی یان تیۆلۆژی کریستانیەت) باوەڕێ کە گۆشت و خوێنی مەسیح لە نان و مەی شێوی خواوەندیدا هەیە (بڕوانە transubstantiation) ۞ 1 هم‌ماهیتی 2 کونسابستانسیون

**consuetude** /'kɒnswɪtju:d/ *noun*
1 (زۆرتر سکاتلەندی) خوو، پیشە، عادەت، 2 custom 2 نیان، هاوجێیی، نزیکی ۞ 1 عادت 2 جماع

**consuetudinary** /-'tju:dɪn(ə)ri/ *adjective*
باو، بەبرەو، بەبڕەو ۞ مرسوم

**consul** /'kɒnsl, US 'kɑ:nsl/ *noun*
شابەندەر، کۆنسول، قۆنسول ۞ کنسول

**consular** /'kɒnsjələ(r), US 'kɑ:nsəl-/ *adjective*
شابەندەری، کۆنسولی، قۆنسولی: *connsular officials* ۞ کنسولی

**consulate** /'kɒnsjələt, US 'kɑ:nsəl-/ *noun*
1 کۆنسولخانە، شابەندەرخانە: *the American consulate in Marseilles* 2 پایە یان پۆستی کۆنسولی 3 (the Consulate) ماوەی حکومەتی کۆنسولی لە فەرەنسەدا ۞ 1 کنسولگری 2 مقام کنسولی 3 کنسولایت

**consulatory** = consultative

**consul-general** /'kɒnsl dʒenrəl/ *noun*
سەرکۆنسول، سەرشابەندەر ۞ سرکنسول

**consulship** /'kɒnlʃɪp/ *noun*
1 کۆنسولگەری، کۆنسولایەتی، پۆست یان پلەوپایەی کۆنسولی 2 سەروبەند یان قۆناخی کۆنسولی، ماوەی لەسەرکاربوونی کۆنسول ۞ 1 مقام کنسولی 2 دوران کنسولی

**consultancy** /kən'sʌltənsi/ *noun, pl.* consultancies
1 راوێژکاری، راوێژگەری، شیرەتقانی، بیر و بۆچوونی راوێژکار، consultation 2 پلەوپایەی راوێژکار ۞ 1 مشاوره 2 کونسولتانسی

**consultant** /kən'sʌltənt/ *noun, adjective*
1 (لە بریتانیا) راوێژکار، راوێژگەر، شیرەتقان 2 پزشکی پسپۆڕ (لە نەخۆشخانە): *a -nsultant surgeon* ۞ 1 مشاور 2 پزشک متخصص

**consultation** /ˌkɒnsl'teɪʃn, US ˌkɑ:n-/ *noun*
1 راوێژکاری، راوێژگەری، شیرەت، شێور، پرسوڕا 2 کۆبوونەوەی پزشکە پسپۆڕەکان (بۆ راوێژ و چارەسەری) 3 کۆبوونەوەی راوێژکاری 4 کۆبوونەوەی فەرمی: *extensive consultations between the two countries* 5 پیاچوونەوە (پرۆسەی گەڕان بە دوای زانیاری و یارمەتیوەرگرتن لە کتێبێ) ۞ 1 مشاوره، مشورت 2 جلسەی پزشکان متخصص 3 جلسەی مشاوره 4 جلسەی رسمی 5 مراجعه

**consultative** /kən'sʌltətɪv/ *adjective*, also consultive
راوێژکاریانە: *a -ultative body/document* ◊ *a consultative committee* ۞ مشورتی

**consulting engineer** *noun*
ئەندازیاری راوێژکار یان راوێژگەر ۞ مهندس مشاور

**consulting room** *noun*
ژووری تیڕوانین (نەخۆشەکان) ۞ اتاق معاینه

**consumable** /kən'sju:məbl, US -'su:m-/ *adjective, noun*
*adj* بەکار دێنرێ، دەخرێتە بەرکار، لەکارکردەنی، دەچێتەکار، مەسرەف دەکرێ: *consumable electronic goods* *n* شتێ کە بەکار دێنرێ ۞ *adj* مصرف‌شدنی *n* چیز مصرفی

**consumer** /kən'sju:mə(r), US -'su:-/ *noun*
بەکارهێنەر، لەکارکەر، کارێنەر، مەسرەفکەر ۞ مصرف‌کننده

**consumer durable** *noun*
کەلوپەلی بەکارهێنراوی قایم یان بەرگەگر ۞ کالای مصرفی بادوام

**consumer goods** *noun, pl.*
کەلوپەلی بەکارهێنراو یا لەکارکردەنی یا مەسرەفی ۞ کالاهای مصرفی

**consumerism** /kən'sju:mərɪzəm, US -'su:-/ *noun*
پاراستنی قازانج و بەرژەوەندی بەکارهێنەر، پشتیوانی لە بەکارهێنەران، مەسرەفگەری: *green consumerism* ۞ مصرف‌گرایی

**consumerist** *noun*
پارێزەری قازانج و بەرژەوەندی بەکارهێنەر،

پــشتیوانی بەکارهێنــەران، مــەســرەفگــەر: *connsumerist values* ۞ مصرفگرا

**consumer price index** *noun, abbreviation* CPI, *pl.* consumer prices index, also cost-of-living index

(بریتانیـا) ئیندیکــسی نرخــی بەکارهێنــەر ۞ شاخص قیمت مصرفکننده

**consumer society** *noun*

کۆمەڵ یان کۆمەڵگای بەکارهێنەر ۞ جامعەی مصرفکننده

**consuming** /kən'sjuːmɪŋ, US -'suː-/ *noun*

توند، بێئەمان، بەهێز، ardent: *Basketball is a consuming* ◊ *his connsuming passion interest* ۞ شدید

**consummate** /kən'sʌmət, US 'kɒnsəmət, US 'kɑːn-/ *adjective*

1 تـەواو، ڕەبـەق، هـەرەباش، بـەرز، perfect 2 پێگەیـشتوو، ڕەسـیدە 3 لێـزان، کارامـە، پوختـە، مامۆسـتا، شـارەزا، وەسـتا: *a consummate professional* ۞ 1 کامل، عالی 2 رسیده 3 ماهر

**consummately** /kən'sʌmətli, US 'kɒnsəmətli, US 'kɑːn-/ *adverb*

بە شێوەیەکی تەواو، ڕەبەقانە ۞ به طور کامل

**consummation** /ˌkɒnsə'meɪʃn, US ˌkɑːn-/ *noun*

1 پێگەیـشتوویی، پێگەیـشتن، تـەواوی، ڕەبـەقی، تـەواوکردن، ڕاپەڕانـدن، هێنانـەدی، بـەدیهـاتن، ئەوپەڕ 2 پێکبڕان، پێـکگەیـشتن، جـووتبـوون، بوونـەزاوا، چوونەپـەردە (بـە کـردنی کـاری سێکـسی) ۞ 1 کمال، تکمیل، اتمام، تحقـق، متهـا 2 وصال، زفاف

**consummative** /kɒnsəmeɪtɪv/ *adjective*

تەواوکەر، ڕاپەڕێنەر ۞ تکمیلکننده

**consummator** *noun*

تەواوکەر، ڕاپەڕێنەر ۞ تکمیلکننده

**consumption** /kən'sʌmpʃn/ *noun*

1 بـەکارهێنان، چوانـدن، مـەسرەف، خـواردن، لـەکارکردن، خەسـارکردن 2 بـڕی بـەکارهێنان، بـڕی بـەکارهێنراو 3 کـاری کـڕین و فرۆشـتنی بەرهەمـەکان 4 بنێـسی، وشـکهـەڵاتن، پێچـوون (لەش) 5 سیل (هی سی)، دەردەباریکـە، بنێـسی، دیق، ئێـشازراف ۞ 1 مصرف، گــارش 2 مقـدار مصـرف، مقدار مصرفشده 3 عمل خرید و فـروش محصـولات 4 تحلیل رفتن بدن، زوال 5 سل

**consumptive** /kən'sʌmptɪv/ *adjective, noun*

سـیلاوی، دیـقدار، تووشـبوو بـە دەردەباریکـە (consumptively *adv*) ۞ مـسلول

**cont.** *abbreviation* 1 contents 2 continued

1 تیابووەکـان، نێـوەڕۆک(ەکـان) 2 درێژەکـەی لە... (ڕۆژنامـە، کۆڤـار و هتـد): *cont. on p74* ۞ 1 محتویات 2 ادامه در...

**contact** /'kɒntækt, US 'kɑːn-/ *noun*

1 لێـککـەوتن، لێکـەوتن، بەریـەککـەوتن، پێـککەوتن، پێکـادان: *a fear of physical contact* 2 لێـکخـشان 3 پێوەنـدی، تێکەڵـی: *The company has maintained trade contacts with India* 4 دیدەنی، یـەکتربینی 5 نزیکـی، نزیـکبوونـەوە، قـەرە، تـوخن(کـەوتن)، نزیکێتی، لێکنزیکی 6 لێککەوتن (ئێلیکتریکی) 7 لەبـەر 8 کلیل (کارەبا) 9 کەسێ کە گومانی لـێدەکـرێ نـەخۆش بـێ 10 (contacts) هاوێنـە(کـان)ی چـاو ۞ 1 تمـاس، برخـورد 2 اصـطکاک 3 ارتبـاط 4 ملاقـات 5 مجـاورت 6 (الکتریکـی) اتـصال 7 معـرض 8 کلیـد (بـرق) 9 کونتاکت 10 (در جمع) لنز(های) چشم

**contact lens** *noun*

هاوێنەی چاو، هاوێنەی لێککەوتەیی ۞ لنز چشم

**contact man** *noun*

دەلاڵ ۞ واسطه

**contact print** *noun*

(وێنەگری) چاپی کۆنتاکت ۞ چاپ کنتاکت

**contact sheet** *noun*

پەڕەی چاپی کۆنتاکت ۞ ورق چاپ کنتاکت

**contacts** = contact lens

**contagion** /kən'teɪdʒən/ *noun*

1 گرتنەوە، داگرتن، تووشبوون، تەشەنە(کردن)، بڵاوبوونەوە، تەنینەوە: *There is no risk of contagion* 2 نەخۆشی بگرەوە، پەتا، درم، ئاهۆ 3 بڵاوبوونەوە، تەنینەوە: *the contagion of political extremism* ۞ 1 سرایت، واگیـرداری 2 بیماری مـسری 3 شیوع، انتشار

**contagious** /kən'teɪdʒəs/ *adjective*

1 بگـرەوە، پـەڕۆک، تەشـەنەکردوو، گـیرۆ، درم، پەتا، پێس: *-ntagious diseases* 2 ڕاگوێزەر(ی نەخۆشی) ۞ 1 واگیردار، مسری 2 ناقل (بیماری)

**contagious abortion** *noun*

جۆرێ brucellosis کە دەبێتەهۆی بەرخستنی پاتاڵ ۞ نوعی بیماری

**contagiously** /kən'teɪdʒəsli/ *adverb*

بەڕۆکانـە، بـە شێوەیەکی بگـرەوە ۞ بــە طــور واگیردار

**contagiousness** /kən'teɪdʒəsnəs/ *noun*

پەڕۆکی، بگرەوەیی ۞ واگیردار بودن

**contagium** /kən'teɪdʒɪəm/ *noun, pl.* contagia /kən'teɪdʒɪə/

مایـەی گرتنـەوە، مایـەگـیر، هـۆی گرتنـەوە ۞ وسیلەی سرایت

**contained** *adjective*

دەسبەسـەرداگیراو، ڕاگیرکـراو، کۆنتـڕۆڵکـراو، مەهارکراو ۞ مهارشده

**container** /kən'teɪnə(r)/ *noun*

1 دەفر، جێ، قاپ 2 سنووق، قوتو، کانتێنێر: *a container ship* ◊ (containerless *adj*) 1 ظرف 2 محفظه، صندوق

**containerization** /kənˌteɪnəraɪˈzeɪʃn/ *noun*
پێچانەوە لە کانتێنێردا، بەستەکردن لە کانتێنێردا ◊ بسته‌بندی در کانتینر

**containerized** /kənˈteɪnəraɪzd / *noun*
پێچـراوە و راگـوێزراو بـە کـانتێنێرەکـان: *containerized cargo* ◊ کانتینریزه

**container ship** *noun*
کەشتی پێچراوەبەر یان کانتێنێری، کەشتی بەستەکێش ◊ کشتی کانتینری

**containing** *adjective*
تیابووی، خاوەنی، داگری، بەرکەوتووی ◊ شامل، دارای

**containment** /kənˈteɪnmənt/ *noun*
1 بەربەست 2 دیاریکردنی هێز و کۆنترۆڵ، نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی هێز، باوەڕ یان ئایدۆلۆژیای دژ ◊ 1 سد نفوذ 2 تعیین یا تحدید قدرت یا کنترل

**contaminant** /kənˈtæmɪnənt/ *noun*
مەتریاڵی پیسکەر یان تێوەدەر، ماک یان مادەی تێوەدەر: *Filters do not remove all - taminants from water* ◊ مادەی آلوده‌کننده

**contaminated** *adjective*
1 پیس، پیسبوو، تێوەدراو 2 تێوەدراو یان پیسبوو بە مەتریاڵی رادیۆئەکتیف ◊ 1 آلوده 2 کونتامیناتد

**contamination** /kənˌtæmɪˈneɪʃn/ *noun*
1 پیسی، تێوەدراوی، لێوەدان، پیسبوون: *radioactive contamination* 2 تێوەدراو بە مەتریاڵی تیشکدەر یان رادیۆئەکتیف ◊ 1 آلودگی، آلایش 2 کونتامیناسیون

**Conté** /ˈkɒnteɪ/ *noun*
جۆرێ crayonی بێچەوری، بۆ کاری هونەری بەکاردێ (بنەڕەت: لە ناوی داهێنەری فەرەنسی Nicolas J. *Conté*) ◊ کانتی

**conte** /kɒnt, French kɔ̃t/ *noun*
1 داستان یان چیرۆکی کورت 2 چیرۆکی گێڕانەوەی(سی) سەدەکانی نێوەڕاست ◊ 1 داستان کوتاه 2 کونته

**contemplation** /ˌkɒntəmˈpleɪʃn, US ˌkɑːn-/ *noun*
1 بیرکردنەوە، تێڕامان، لێکۆڵینەوە، قووڵبوونەوە، تێڕوانین، لەبەرچاوگرتن 2 نیاز، مەبەست، خەیاڵ، چاوەڕوانی، تەماوەری، بەتەمابوون، بەهیوابوون 3 چاولێکردن، روانین، تەمەشاکردن ◊ 1 تفکر، تأمل، درنظرگیری 2 قصد، توقع، انتظار 3 تماشا، مشاهده

**contemplative** /kənˈtemplətɪv/ *adjective, noun*
(کەسێکی) بیرکەرەوە، بیریار، بیرمەند، تێڕاماو، ئەهلی تێڕامان، تێڕاماوی دینی: *He gave her a contemplative look* ◊ *the contemplative life* (contemplatively *adv*: بیرکەرەوانە) ◊ متفکر، معنوی

**contemporaneity** /kənˌtempərəˈniːɪti/ *noun*
هاوکاتی ◊ تقارن، هم‌زمانی

**contemporaneous** /kənˌtempəˈreɪniəs/ *adjective*
هاوکات: *contemporaneous accounts* ◊ *contemporaneous events* ◊ مقارن، هم‌زمان

**contemporaneously** /kənˌtempəˈreɪniəsli/ *adverb*
هاوکاتانە ◊ به طور هم‌زمان

**contemporary** /kənˈtemprəri, US -pəreri/ *adjective, noun* (*pl.* contemporaries)
1 هاوچەرخ، هاوسەردەم، هاوڕۆژگار، هاوکات، هاودەم 2 تازە، نوێ، نەو: *contemporary music* 3 هاوتەمەن ◊ 1 معاصر، هم‌زمان 2 جدید 3 هم‌سن

**contempt** /kənˈtempt/ *noun*
1 سووکایەتی، سووکیپێکردن، ئابڕوویردن، شرتوشۆدەرهێنان: *She looked at him with -empt* 2 سووکی، نزمی، چرووکی، گوێپێنەدان، بەهێندنەگرتن 3 بێزاری 4 بێڕێزی، بێحورمەتی 5 سووکایەتی بە دادگا ◊ 1 اهانت، تحقیر 2 خفت 3 تنفر 4 بی‌احترامی 5 اهانت به دادگاه

**contemptibility** /kənˌtemptəˈbɪləti/ *noun*
سووکی، نزمی، چرووکی ◊ پستی، خواری، حقارت

**contemptible** /kənˈtemptəbl/ *adjective*
1 سووک، چرووک، نزم، گەڕۆڵ، پەست، شایانی سووکیپێکردن: *contemptible behaviour* 2 (بێباو) = scornful ◊ خوار، قابل تحقیر

**contemptibly** /kənˈtemptəbli/ *adverb*
بە سووکایەتییەوە، سووکانە ◊ با تحقیر

**contempt of court** *noun*
سووکایەتی بە دادگا، بێڕێزی بە دادگا ◊ اهانت به دادگاه

**contemptuous** /kənˈtemptʃuəs/ *adjective*
سووکیپێکەر، ئابڕووبەرە، بێزار، بێزراو، سووکانە، سووکایەتییانە: *She gave him a - ptuous look.* ◊ تحقیرکننده، متنفر، اهانت‌آمیز

**contemptuously** /kənˈtemptʃuəsli/ *adverb*
بە سووکایەتییەوە، بە سووکییەوە، سووکانە: *to laugh contemptuously* ◊ با تحقیر

**contender** /kənˈtendə(r)/ *noun*
نەیار، هەڤڕک، رکەبەر ◊ رقیب، حریف

**contending** *adjective*

countess ی ئیتالیایی ◌ کونتسا

**contest** /'kɒntest, US 'kɑːn-/ *noun*
پێشبڕکێ، رقەبەرایەتی، بەرامبەرکێ، بەرامبەرێن، بەربەرەکانێ، ململانێ، زۆرەزمێ، رکەبەری، ناکۆکی، کێشە، دووبەرەکی، کێشمەکێش، قرە، جوڕڕە، مشتومڕ: *a talent contest* ◌ مسابقه، رقابت، مبارزه، اختلاف، نزاع

**contestable** *adjective*
شیاوی ململانێ ◌ قابل منازعه

**contestant** /kən'testənt/ *adjective*
1 نەیار، هەڤرک، رکەبەر 2 بەشداریکەر، پێشبڕکێوان: *Please welcome our next contestant.* ◌ 1 حریف، رقیب 2 شرکت‌کننده

**contestation** /kɒntes'teɪʃn/ *noun*
ململانێ، ناکۆکی، مشتومڕ ◌ منازعه

**context** /'kɒntekst, US 'kɑːn-/ *noun*
1 تەڤنار، تەونار، بوار، چوارچێوە، تانوپۆ، زەمینە، تەختار، دەق، پێکەوەچنراو 2 هەلومەرج، بارودۆخ، رەوش: *This speech needs to be set in the -t of Britain in the 1960s* (*adj* contextless، بنەڕەت: لە لاتین، لە -con "پێکەوە" + *texere* *contextus* "چنین (بە شێوەی تانوپۆیی)") ◌ 1 زمینه، بافت، متن، سیاق عبارت، بهم‌تافته 2 شرایط، موقعیت

**contextual** /kən'tekstʃuəl/ *adjective*
دەقی، تەختاری، مەتنی، سەربە دەق، سەربە تەختار یان تەڤنار، بەپێی دەق، دەقانە: *-textual contextual clues to the* ◊ *information meaning* ◌ وابسته به متن، بافتی، مطابق متن

**contextualism** *noun*
تەختارگەری، تەختارخوازی، زەمینەگەری، زەمینەخوازی، کانتێکسچوالیزم (= تیۆرییێ لە جوانیناسیدا، کە بەپێی ئەو دەبێ جوانی بەرهەمێکی هونەری لە تەختار و کانتێکستی گشتی‌یەکەیدا بدۆزرێتەوە) ◌ بافت‌گرایی

**contextualist** *noun*
تەختارگەر، تەختارخواز، زەمینەگەر، زەمینەخواز، کانتێکسچوالیست ◌ بافت‌گرا

**contextually** /kən'tekstʃuəli/ *adverb*
لەباری دەقی یان تەختاری‌یەوە ◌ از نظر متنی یا بافتی

**contexture** /kən'tekstʃə(r)/ *noun*
1 تەڤن، تەونار، زەمینە، بنیات، پێکهاتە، تەختار، دەق، context 2 پێکهاتەیێکی تێکچنراو (contextural *adj*) interwoven structure (contextured *adj*) ◌ 1 بافت، ترکیب، سیاق 2 ساختار درهم‌تنیده

**contg.** = containing

**contiguity** /ˌkɒntɪ'gjuːəti, US ˌkɑːn-/ *noun, pl.* contiguities
1 دراوسێیی، یەکگیری، لەپاڵ‌یەکدابوون،

نەیار، هەڤرک، رکەبەر، دژبەر، دژ ◌ رقیب، مخالف

**content**[1] /kən'tent/ *adjective*
1 رازی، قایل، قانع، ملکەچ، بەقنیات 2 پێخۆشبوو، ئامادە، حازر، ساز ◌ 1 قانع، راضی، متقاعد، خرسند 2 مایل

**content**[2] /'kɒntent, US 'kɑːn-/ *noun*
پێخۆشبوون، قایلبوون، بێ‌نیازی، رازی‌بوون، قنیات، قایلی، رەزامەندی ◌ رضایت، خشنودی

**content**[3] /'kɒntent, US 'kɑːn-/ *noun*
1 ناوەرۆک، نێوەرۆک، نێواخن، تیایە 2 بڕ، رادە، بارستە: *food with a high fat content* ◌ 1 محتوا، مضمون 2 مقدار، میزان

**contented** /kən'tentɪd/ *adjective*
رازی، قایل، قانع، بێ‌نیاز، نیشانەی پێخۆشبوون: *a contented* ◊ *He was a contented man smile* ◌ قانع، خشنود، حاکی از خشنودی

**contentedly** /kən'tentɪdli/ *adverb*
بە پێخۆشبوونەوە: *She smiled contentedly* ◌ با رضایت

**contention** /kən'tenʃn/ *noun*
1 بەربەرەکانێ، رقەبەرایەتی، ململانێ، شەڕوکێشە، پێشبڕکێ، رکەبەری 2 مشتومڕ، جوڕڕە، شەڕەقسە، دەمەدەمە 3 بۆچوون، بیروبۆچوون، روانگە ◌ 1 رقابت، مبارزه، نزاع، مسابقه 2 جدال، مشاجره 3 نظر، نقطه‌نظر

**contentious** /kən'tenʃəs/ *adjective*
1 شەڕفرۆش، شەڕانی، جینگزی، سەربەگێچەڵ، دەمگەرم، شەڕەنگێز، سەرلەشەڕخوراو 2 کێشەلەسەر، مشتومڕلەسەر، کێشاوی: *a contentious issue/topic/subject* ◌ 1 ستیزه‌جو، دعوایی 2 مورد اختلاف، متنازع‌فیه

**contentiously** /kən'tenʃəsli/ *adverb*
شەڕەنگێزانە، شەڕفرۆشانە ◌ ستیزه‌جویانه

**contentiousness** /kən'tenʃəsnəs/ *noun*
شەڕفرۆشی، شەڕەنگێزی، سەربەگۆنگەڵی ◌ ستیزه‌جویی

**contentment** /kən'tentmənt/ *noun*
پێخۆشبوون، قایلبوون، رازی‌بوون، قایلی، رەزامەندی: *a sigh of contentment* ◌ رضایت، خشنودی، خرسندی

**contents** *noun, pl.*
1 نێوەرۆک، نێواخن، کەلوپەل (ی نێومال)، تیایان 2 نێوەرۆک، پێرست، بابەت‌نامە ◌ 1 محتویات، اسباب، مضمون، مندرجات 2 فهرست

**conterminous** /kɒn'tɜːmɪnəs/ *adjective*. also conterminal
هاوسنوور، هاوکەوشەن، هاوسەرحەد، دیواربەدیوار، لێک‌نزیک: *conterminous countries* coterminous ◌ مجاور، هم‌مرز

**contessa** /kɒn'tɛsə/ *noun*

یەکان گیری، نزیکی، لێک‌نزیکی، نزیکایەتی 2 بەریەک‌کەوتن، یەک‌گرتن، تێک‌گیراوی، لێک‌کەوتن 3 پێوەندی، پێکەوەبەستراوی، پێکەوەنووساوی ◊ 1 مجاورت، هم‌پهلویی، قرابت 2 تماس 3 ربط، پیوستگی

**contiguous** /kən'tɪgjuəs/ *adjective*
دراوسێ، هاودیوار، نزیک، هاوتەنیشت، لێک‌نزیک، لەپاڵ‌یەک، یەک‌گیر، 1 تێک‌گیراو، لێک‌کەوتوو، پێکەوەنووساو، پێکەوەبەستراو 2 پەیتاپەیتا لەپشت‌سەریەک، دوابەدوای‌یەک ◊ 1 مجاور، همسایه، متصل 2 متوالی

**contiguously** /kən'tɪgjuəsli/ *adverb*
لەپاڵ‌یەک‌دا، پاڵ‌بەپاڵ ◊ به طور مجاور

**contin.** = continued

**continence** /'kɒntɪnəns, US 'kɑːn-/ *noun,* also continency
1 داوێن‌پاکی، پارێزگاری، بەرخۆگرتن، خودداری، خۆڕاگرتن، دەس‌بەسەرخۆداگرتن 2 خۆڕاگری، خۆگرتن، قایمی (کاری دەس‌بەئاو) ◊ 1 کف نفس، خویشتن‌داری 2 خودداری

**continent**[1] /'kɒntɪnənt, US 'kɑːn-/ *adjective*
1 پارێزگار، داوێن‌پاک، خۆڕاگر، دەس‌بەسەرخۆداگر، خوددار 2 قایم، خۆڕاگر، (کاری دەس‌بەئاو) ◊ 1 خویشتن‌دار، با کف نفس 2 خوددار

**continent**[2] /'kɒntɪnənt, US 'kɑːn-/ *noun*
1 کیشوەر، وشکار، وشکانە: *the -nt of Africa* 2 (the Continent) ئەورووپای رۆژاوا، ئەورووپا (بێجگەلە بریتانیا؛ بنەڕەت: لە *terra continens* لاتین " زەوی یەک‌پارچە یان لەسەریەک "continuous land") ◊ 1 قاره 2 اروپا

**continental**[1] /ˌkɒntɪ'nentl, US ˌkɑːn-/ *adjective*
1 وشکاری، وشکانەیی، کیشوەری، سەربە وشکار یا کیشوەر: *continental waters* ◊ *to study continental geography* 2 ئەورووپایی (بێجگەلە بریتانیا): *a popular continental holiday resort* 3 (سەربە) ئەمریکای باکووری (بێجگەلە ئالاسکا و هاوایی؛ continentally *adv*) ◊ 1 قاره‌ای 2 اروپایی (به جز بریتانیا) 3 (وابسته به) امریکای شمالی

**continental**[2] /ˌkɒntɪ'nentl, US ˌkɑːn-/ *noun*
خەڵکی ئەورووپا (بێجگەلە بریتانیا) ◊ اهل اروپا

**continental breakfast** *noun*
بەیانی‌یانە (بێ‌چێشت) ◊ صبحانه

**continental climate** *noun*
مەڵبەندی (ئاو و هەوا) وشکاری یان کیشوەری ◊ اقلیم قاره‌ای

**continental drift** *noun*
رامالینی وشکاری یا کیشوەری ◊ رانش قاره‌ای

**continental quilt** = duvet

**continental shelf** *noun*
بانوو یا بانی کیشوەری، بانی وشکار ◊ فلات قاره

**continental slope** *noun*
لێژایی کیشوەری یان وشکاری: لە بانی وشکاری‌یەوە تا تەختی ئۆقیانووس ◊ شیب قاره‌ای

**continently** /'kɒntɪnəntli, US 'kɑːn-/ *adverb*
پارێزگارانە، داوێن‌پاکانە ◊ پرهیزکارانه

**contingence** *noun,* also contingency
لێک‌کەوتن، بەریەک‌کەوتن ◊ تماس

**contingency** /kən'tɪndʒənsi/ *noun, pl.* contingencies
1 رێکەوتن، روودان، هەڵکەوتن، پێش‌هاتن، رووداو 2 لەوانەیی‌بوون، رەنگەیی، شیمانە، شیان، ئەگەر، رێ‌تێچوون 3 ئەگەری روودان یان روونەدان 4 (فەلسەفە) نەبوونی پێویستی ◊ 1 اتفاق، حادثه 2 احتمال، امکان 3 احتمال وقوع یا عدم وقوع 4 (فلسفه) نبود یا عدم ضرورت

**contingent** /kən'tɪndʒənt/ *adjective, noun*
*adj* 1 نادیار، رێکەوتی 2 ئەگەری، شیمانەیی، رێ‌تێچوو، لەوەدەچی، رەنگە، لەوانەیە 3 بەندە بە، بە مەرجی، بەستراوەتەوە بە *n* 1 رووداوی کت‌وپڕ یان نادیار 2 گرووپ، کۆمەڵ 3 هێز، سەرباز 4 شاندە، نێردراو ( contingently /kən'tɪndʒəntli/ *adv*) ◊ *adj* 1 اتفاقی 2 احتمالی، محتمل 3 مشروط به *n* 1 حادثه‌ی غیرمنتظره 2 گروه 3 نیرو 4 گروه اعزامی

**continua** /kən'tɪnjuə/ = plural form of continuum

**continual** /kən'tɪnjuəl/ *adjective*
یەکبینە، هەمیشە، لەسەریەک، بە بەردەوامی، چەندبارەوەبوو: *He was in a -inual process of rewriting his material* ◊ *a history of continual invasions* ◊ پیوسته، دائمی، مکرر

**continually** /-juəli/ *adverb*
یەکبینە، لەسەریەک، هەمیشە، بێ‌پسانەوە: *They argue -ally about money* ◊ پیوسته، همواره

**continuance** /kən'tɪnjuəns/ *noun*
1 بەردەوام‌بوون، لەسەررۆیشتن، پێوەرۆیشتن، پەستایی، درێژەدان، یەکبینەیی 2 مانەوە، ماوە 3 (ئەمریکا، ماف) دواخستن، پاش‌خستن: *The judge refused his motion for a -nce* ◊ 1 تداوم، استمرار 2 بقا 3 تعویق

**continuant** /kən'tɪnjuənt/ *noun, adjective*
(دەنگ‌ناسی) *n* نەبزوێنی پەستایی یان بەردەوام (پیتێکی نەبزوێن کە بتوانرێ درێژ بکرێتەوە، وەکوو *f, l, m, n, r, s, v*) *adj* 1 پەستایی، 2 بەردەوام: *continuant consonants*

دریژەدەر، بەردەوامکەر، هۆکاری بەردەوامی یان دریژەدان ◌ *n* هەمخوان پیوستە 1 *adj* پیوستە 2 ادامەدهندە

**continuation** /kənˌtɪnju'eɪʃn/ *noun*

1 دریژەدان، لەسەررۆیشتن، پێوەرۆیشتن، مانەوە، بەردەوامکردن، دۆمانـدن، یەکبینەیی 2 بەدوادارۆیشتن، شوێن‌کەوتن 3 تێهەڵچوونەوە، دەس‌پێکردنەوە 4 راگرتنی کاتی دادگا، پشوو، وچان 5 پاشکۆ، دریژە، پاشماوە ◌ 1 ادامە، تداوم 2 تعقیب 3 ازسرگیری 4 تنفس (دادگاە) 5 دنبالە، تتمە، باقی

**continuation school** *noun*

خوێندنگای دریژەدان یان تێهەڵچوونەوە (بۆ ئەو منالانەی کە گیرەوکێشەی کۆمەلایەتی‌یان هەیە) ◌ مدرسەی ازسرگیری

**continuative** /kən'tɪnjʊətɪv/ *adjective, noun*

(زمانەوانی) دریژەدەرانە *adj* وشە یان دەستەوشەی دریژەدەرانە (ب.ت. *as well ,yes* (*I was saying* ◌ کانتیوتیو

**continuator** *noun*

دریژە(پێ)دەر، بەردەوامکەر، دۆمێنەر ◌ ادامەدهندە

**continued** /kən'tɪnju:d/ *adjective*

یەکبینە، بەردەوام، دریژەدار، بێ‌وچان ◌ مستمر، مداوم، ادامەدار

**continued fraction** *noun*

کەرتی دریژەدار ◌ کسر ممتد

**continued proportion** *noun*

هاوریژەی دریژەدار ◌ تناسب ممتد

**continuing education** = adult education

**continuity** /ˌkɒntɪ'nju:əti, US ˌkɑ:ntə'nu:-/ *noun, pl.* continuities

1 دریژەدان، بەردەوامی، مانەوە، لەسەررۆیشتن، یەکبینەیی 2 پێک‌بەستراوی، پێکەوەبەستراوی 3 پێوەندی لۆژیکی (نێوان چەند بەشێ) ◌ 1 تداوم، استمرار 2 اتصال 3 ارتباط منطقی

**continuity announcer** *noun*

بێژەری دریژەدان (لە رادیۆ، تەلەفزیۆن و لە باری بەرنامەی داهاتووەوە زانیاری دەداتێ) ◌ کانتینیوتی آنونسر

**continuous** /kən'tɪnjuəs/ *adjective*

1 یەکبینە، بەردەوام، هەمیشە، بێ‌پسانەوە، زنجیرەیی، لێک‌هەڵنەپچڕاو، یەکسەرە، لەسەریەک 2 پێکەوەبەستراو 3 (ریزمان) بەردەوامی: *the -tinuous tenses* ◌ 1 پیوستە، مدام، مسلسل 2 متصل 3 (دستور زبان) استمراری

**continuous assessment** *noun*

هەڵسەنگاندنی بەردەوام یان بە دریژایی ماوە(کە) ◌ سنجش مستمر

**continuous distillation** *noun*

یەکبینە دلۆپاندن، دلۆپاندنی بەردەوام یان یەکبینە ◌ تقطیر پیوستە

**continuously** /kən'tɪnjuəsli/ *adverb*

هەر، یەکبینە، لەسەریەک، یەک‌وچان، پەیتاپەیتا، خێراخێرا، خۆش‌خۆش: *the continuously changing situation* ◌ بە طور پیوستە

**continuous spectrum** *noun*

شەبەنگی بەردەوام یان یەکبینە ◌ طیف پیوستە

**continuous tense** *noun,* also progressive tense

(ریزمان) سەردەم یان کاتی بەردەوامی ◌ زمان استمراری

**continuum** /kən'tɪnjuəm/ *noun, pl.* continua or continuums

پێکبەستە، زنجیرە، پەیتایی، زنجیرەجیاوازی، کانتینیوم ◌ پیوستار

**continuum of energy** *noun*

پێکبەستەی یان زنجیرەجیاوازی وزە ◌ پیوستار انرژی

**continuum state** *noun*

دۆخی پێکبەستە یان زنجیرەجیاوازی ◌ حالت پیوستار

**contorted** *adjective*

1 خواروخێچ، پلۆچاوی، چەپ‌وچیر، بەرتۆر، بەپێچ‌وپلۆچ، لار، گێر، خوار 2 هەڵپێچراو، بادراو، تێک‌ئالاو، شێواو، تێکچوو، ئالۆز(او)، ئالۆسکاو، تێکەولێکە ◌ 1 معوج، کج و کولە 2 پیچیدە، آشفتە

**contortion** /kən'tɔ:ʃn, US -'tɔ:rʃn/ *noun*

خواروخێچی، پێچ، چەپ‌وچیری، خواری، گێری، بادان، هەڵپێچان، پێچان، لوول‌کردن، تێک‌ئالاندن، چەوتان، پێچاندن، پێچ‌پێدان ◌ اعوجاج، عمل پیچیدن، پیچ و تاب

**contortionist** /kən'tɔ:ʃənɪst, US -'tɔ:rʃ-/ *noun*

کانتۆرشنیست، خۆباهەڵدەر، لەشگێڕ (= کەسێ کە دەتوانێ لەشی خواروخێچ کاتەوە یان پێچی پێ‌بدا) ◌ کانتورسیونیست

**contour** /'kɒntʊə(r), US 'kɑ:ntʊr/ *noun*

1 کانتۆر، بیچم، شێوە، روخسار، پلان 2 پەراوێز، قەراغ، تەنیشت 3 رەوش، بارودۆخ، کاودان 4 چەماوەی ئاست، هێڵی ریک ◌ 1 نما، طرح، شکل 2 حاشیە 3 وضعیت 4 خط تراز

**contoured** /'kɒntʊəd, US 'kɑ:ntʊrd/ *adjective*

خاوەنی چەماوەی ئاست، هێڵی ریک پیشان دەدا ◌ دارای خط تراز

**contour line** *noun*

چەماوەی ئاست، هێڵی ریک: هێڵێ (وەک هی سەر نەخشە) کە ئەو خاڵ و شوێنەکانی سەر رووی عەرز پێکەوە دەبەستێتەوە کە هەمان

ئاست یان بەرزاییان هەیە ◇ خط تراز

**contour map** *noun*

نەخشەی چەماوەی ئاست یان هێلی ڕێک ◇ نقشەی خط تراز

**contra-** /ˈkɒntrə, US ˈkɑːntrə/ *prefix*

پێشگر: دژ، پێچەوانە، پەرچە، لە بەرامبەر، لە هەمبەر: *contraception* ،*contradistinction* (بنەڕەت: لە *contra* لاتینەوە "against") ◇ پیشوند: پاد، ضد

**contra** /ˈkɒntrə/ *noun*, short of -arrevolucionario 'counterrevolutionary'

ئەندامی هێزی گەریلای نیکاراگوا (لەلایەن ئەمریکاوە پشتیوانی دەکرا) کە بەرهەڵستی حکومەتی Sandinista (1979–90)ی باڵی چەپیان دەکرد ◇ کونترا

**contraband** /ˈkɒntrəbænd, US ˈkɑːn-/ *noun, adjective*

*n* قاچاخ، کەلوپەلی بەربەند(کراو): *adj contraband goods* بەربەندە، قەدەغە، قاچاخی ◇ *n* قاچاق، کالای ممنوعه *adj* قاچاقی

**contrabandist** *noun*

قاچاخچی ◇ قاچاقگر

**contrabass** /ˈkɒntrəbeɪs, US ˈkɑːn-/ *noun*

کۆنترابــاس (گەورەترین و بۆڕترین ئامێری ئارشەیی) ◇ کنتراباس

**contrabassoon** = double bassoon

**contraception** /ˌkɒntrəˈsepʃn, US ˌkɑːn-/ *noun*

پێشگیری، بەرگیری، نەهێشتنی سکپڕی یان زگپڕی، دژەسکپڕی ◇ جلوگیری

**contraceptive** /ˌkɒntrəˈseptɪv, US ˌkɑːn-/ *adjective, noun*

*adj* سەربە بەرگیری *n* کەرەسەی بەرگیری، بەرگیرە (دەزگا، دەرمان، شێواز یان کردەوەیێ) ◇ *adj* وابسته به جلوگیری *n* وسیلەی جلوگیری

**contract** /ˈkɒntrækt, US ˈkɑːn-/ *noun, adjective*

*n* 1 قەراروبڕێ، گرێبەست، بەڵێننامە، پەیمان، بڕیار، ڕێککەوتننامە: *a -act of employment* 2 مارەبڕین، مارەکردن، مارەنامە، قەباڵە، قەراروبڕیی زەماوەند *adj* پەیمانی، بەڵێننامەیی، بڕیاری ◇ *n* 1 قرارداد، پیمان، توافق‌نامه 2 عقد، عقدنامه، قرارداد عروسی *adj* قراردادی

**contract bridge** *noun*

جۆرێ کایە بە پاستۆر ◇ نوعی بازی با ورق

**contracted** *adjective*

1 قرچهەڵاتوو، کرژەوەبوو، کۆوەبوو، هەڵقرچاو، چووەتە یەک، چکۆلەوەبوو، چووەیەک 2 کورتە 3 بیرتەسک ◇ 1 منقبض، جمع‌شده 2 مختصر 3 تنگ‌نظر

**contractibility** /kənˌtræktəˈbɪlətɪ/ *noun*

لەکرژیهاتوویی، لەهەڵقرچانهاتوویی، کرژەوەبوویی ◇ انقباض‌پذیری

**contractible** /kənˈtræktəbl/ *adjective*

لەکرژیهاتوو، کرژەوەبوو، هەڵقرچاو، شیاوی چوونەیەک، لەهەڵقرچانهاتوو، دەچێتەیەک، هەڵدەقرچێ، کرژ دەبێ ◇ انقباض‌پذیر

**contractile** /kənˈtræktaɪl/ *adjective*

لەکرژیهاتوو، کرژەوەبوو، هەڵقرچاو، کۆوەبوو، ویکهاتوو ◇ انقباض‌پذیر، منقبض‌شونده

**contractility** /kɒnˌtræktɪlətɪ/ *noun*

هێزی کرژبوون ◇ قوەی انقباض

**contraction** /kənˈtrækʃn/ *noun*

1 چوونەیەک، هاتنەیەک، هاوکێشی، یەکترکێشی، چرچهەڵاتن، کرژبوون، هەڵقرچان، کۆبوونەوە، کۆوەبوون، ویکهاتن، چکۆلەبوونەوە، تێکترنجان، هەڵقرچاندن، کرژاندن، ویکهێنان 2 کورتە، وشەی کورتەوەکراو، تێکهەڵکێشراو، شێوەی کورتەوەبووی وشەیێ (وەکوو *He is. He has* کە دەبێتە *He's* ڕێزمان) 3 ژانەبوون، ژانوبرک، ژانوژۆ (منداڵبوون) 4 بێبازاڕی، کەسادی 5 (نەخۆشی) تووشبوون، دوچاربوون، گرتن، پیاپێکران ◇ 1 انقباض، عمل منقبض کردن 2 اختصار، کلمه یا صورت کوتاه‌شده (دستور زبان) 3 درد زایمان 4 رکود 5 ابتلا

**contraction theory** *noun*

بیردۆز یان تیۆری چوونەیەک، تیۆری کرژبوون ◇ نظریەی انقباض

**contractor** /kənˈtræktə(r)/ *noun*

برکار، قەباڵکار، کۆنتراکتوان، قۆنتەراتچی، کۆنتراکتکار، بەڵێندەر ◇ پیمانکار، مقاطعه‌کار

**contractual** /kənˈtræktʃuəl/ *adjective*

پەیماننامەیی، سەربە بەڵێننامە، بڕیارنامەیی، بەپێی بڕیارنامە: *We have contractual obligations to control prices* ◇ وابسته به قرارداد، طبق قرارداد

**contractually** /kənˈtræktʃuəli/ *adverb*

بەگوێرەی بڕیارنامە، بەپێی بەڵێننامە ◇ مطابق قرارداد

**contradictability** *noun*

بەدرۆخراوی ◇ تکذیب‌پذیری

**contradictable** *adjective*

بەدرۆ دەخرێتەوە، بەرپەرچ دەدرێتەوە ◇ تکذیب‌پذیر

**contradiction** /ˌkɒntrəˈdɪkʃn, US ˌkɑːn-/ *noun*

1 پێکدژی، هاوناکۆکی، یەکنەگرتنەوە، هاودژی، دژبەیەکبوون، دژایەتی، دژبەری، پۆزبەری، بەرهەڵستی، ناکۆکی، جیاوازی 2 پێشێل کردن، شکاندن 3 ڕەتکردنەوە، بەرپەرچ(دانەوە)، لە ڕوودا وەرگەڕانەوە،

نەلێکردن، نکوڵی (لێکردن)، حاشا (لێکردن)، بەدرۆخستنەوە، ڕەددانەوە 4 دژی، پێچەوانەی ◌ 1 تناقض، تضاد، مخالفت، اختلاف، خلاف گویی 2 نقض 3 رد، انکار، تکذیب 4 مغایر، ضد

**contradictor** *noun*
بەدرۆخەرەوە، بەرپەرچدەرەوە ◌ تکذیب‌کننده

**contradictoriness** *noun*
پێکدژی، پێکناکۆکی، یەکنەگرتنەوە، هاودژی، دژبەیەکبوون ◌ تناقض

**contradictory** /ˌkɒntrəˈdɪktəri, US ˌkɑːn-/ *adjective, noun,* also contradictive
(وتە) دژبەیەک، پێکدژ، هاودژ، پێکناکۆک، دژ، یەکنەگرەوە، یەکناگیر، چەواشە، جیاواز: *We are faced with two apparently contradictory statements* ◌ متناقض، متباین، متضاد، ضد و نقیض

**contradistinction** /ˌkɒntrədɪˈstɪŋkʃn, US ˌkɑːn-/ *noun,* in contradistinction to
1 (بە) پێچەوانەی، چەواشەی، لە بەرامبەر، لە هەمبەر: *Lionesses, in -ntradistinction to the females of other animals, are the hunters* 2 لێککردنەوە، جیاوازیدانان ◌ 1 برخلاف، در تقابل با 2 تشخیص

**contrafactive** *adjective*
(زمانەوانی) دژەفەکتیف (ئەو کارانە verbی کە لەبارەی شتێکی نەکردەوە دەدوێن، وەکوو: *(pretend, wish* ◌ کونترافکتیو

**contrail** /ˈkɒntreɪl/ *noun*
شوێنی فڕۆکە، هەوری فڕۆکە (لە ئاسماندا) ◌ رد هواپیما

**contraindication** /ˌkɒntrəˌɪndɪˈkeɪʃn, US ˌkɑːn-/ *noun*
بەکارناهێنریّ (دەرمان، ڕەنگە زیاناوی بێ) ◌ مورد عدم استعمال

**contralto** /kənˈtræltəʊ, US -toʊ/ *noun, pl.* contraltos
کۆنترالتۆ (بۆرترین دەنگی ژنان)، گۆرانیبێژی کۆنترالتۆ ◌ کنترالتو

**contraposition** = opposition

**contrapposto** /ˌkɒntrəˈpɒstəʊ/ *noun, pl.* contrapposti /-ti/
(را)وێستانی ناهاوتا (لە پەیکەرتاشی کلاسیکدا) ◌ کونتراپوستو

**contraption** /kənˈtræpʃn/ *noun*
دەزگا یان ماشینی سەیر (و سەمەرە)، کەلەکەتری: *She showed us a strange contraption that looked like a satellite dish* ◌ دستگاه یا ماشین عجیب‌وغریب

**contrapuntal** /ˌkɒntrəˈpʌntl, US ˌkɑːn-/ *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە counterpointـەوە هەیە ◌ کونتراپیونتال

**contrapuntist** *noun*
کۆنتراپیونتیست، پێکەوەژەن، هاوژەن ◌ کونتراپیونتیست

**contrariant** /kɒnˈtrərɪənt/ *adjective*
دژ، ناکۆک ◌ مخالف

**contrariety** /ˌkɒntrəˈrʌɪəti/ *noun, pl.* -ties
لێکدژی، دژایەتی، دژبەری، ناکۆکی، دژیتی ◌ تضاد، مغایرت

**contrariwise** /ˈkɔntreəriwaɪz, US -trer-/ *adverb*
1 بەدژی، دژی، پێچەوانەی، بەشێوەیەکی ناوەژوو یان پێچەوانە، 2 vice versa دژ، چەواشە 3 پێچەوانە (با) ◌ 1 برخلاف، مغایر، به طور معکوس 2 متضاد 3 مخالف (باد)

**contrary**[1] /ˈkɒntrəri, US ˈkɑːntreri/ *adjective*
لاسار، گوێنەبیس، لاـ، ناحاڵی، کەللەڕەق (contrarily *adv*: لاسارانە، دژانە؛ contrariness /kənˈtreərinəs/ *n*: لاساری، گوێنەدەری، سەرسەختی، لایی، کەللەڕەقی، ناحاڵیتی) ◌ نجوج، یکدنده

**contrary**[2] /ˈkɒntrəri, US ˈkɑːntreri/ *noun, adjective*
دژ، پێچەوانە، بە پێچەوانەوە، چەواشە، بەرقاژی، *Contrary to popular belief, many cats dislike milk* ◊ opposite: contrary (زاراوەکان: *advice/opinions/arguments* by contraries: بە پێچەوانەی ئەوەوە کە چاوەڕوان دەکرێت یان لۆژیکی بێت، پێچەوانەی چاوەڕوان بوون، (go -) بە پێچەوانە ڕوودان.: on the contrary: بە پێچەوانەوە: *'It must have been terrible.' 'On the contrary, I enjoyed every minute.'* quite the contrary: بەڵکوو تەواو بە پێچەوانەی: *I don't find him funny at all. Quite the contrary*: to the contrary: بە پێچەوانەی ئەوەوە: *Show me some evidence to the contrary*) ◌ ضد، عکس، متضاد

**contrast** /ˈkɒntrɑːst, US ˈkɑːntræst/ *noun*
1 هەڵسەنگاندن، پێکگرتن 2 دژایەتی، پۆزبەری، لێکنەهاتن، یەکنەگرتنەوە، جیاوازی، ناکۆکی 3 پێچەوانە، ئاوەژوو 4 شتێکی جیاواز ◌ 1 مقایسه 2 تباین، تضاد، اختلاف 3 عکس 4 چیز متفاوت

**contrasting** /kənˈtrɑːstɪŋ, US -ˈtræs-/ *adjective*
جیاواز، (پێک)ناکۆک، دژ، یەکنەگرەوە، لێکنەهاتوو: *bright, contrasting colours* (contrastingly *adj*) ◌ مختلف، متضاد، متفاوت

**contrastive** /kənˈtrɑːstɪv/ *adjective*

(زمانەوانی) جیاوازی‌یانە، جیاوازمەند: جیاوازی نێوان زمانە (و زاراوە)کان دەخاتە ڕوو: *a -rastive analysis* ◊ *contrastive analysis of British and Australian English* (contrastively *adv*) ◌ تباینی، مقابله‌ای

**contrasty** *adjective*
(نافەرمی، وێنە، فیلم و هتد) بە ئاستی کۆنتراستێکی بالاوە ◌ کنتراستی

**contravention** /ˌkɒntrəˈvenʃn, US ˌkɑːn-/ *noun*
پێشێل کردن، بنبڕ کردن، شکاندن، مل‌بادان، ڕەچاونەکردن، (سنوور)بەزاندن، لەبەرچاونەگرتن، سەرپێچی ◌ نقض، تخطی، تخلف، تضاد

**contredanse** /ˈkɒntrədɑːns, US -dɒ̃s/ *noun*
1 شێوەیێکی فەرەنسی هەڵپەڕکێ یان سەمای لادێیی 2 پارچە موسیقایێ بۆ ئەو هەڵپەڕکێیە ◌ کونتردنس

**contretemps** /ˈkɒntrətɒ̃, US ˈkɑːntrətɑ̃ː/ *noun, pl.* same /-tɒ̃z/
1 (فەرەنسی) ڕووداوی جەرگبڕ یا ناخۆش، کۆست، بوویەری دڵتەزێن، قەومینی تاڵ: *They have been ignoring me since our last contretemps* 2 جیاوازی، کێشمەکێش، ناکۆکی ◌ 1 حادثه‌ی ناگوار 2 اختلاف

**contributing** *adjective*
کاریگەر، شوێن‌دانەر، بەباندۆر ◌ تأثیرگذار

**contributing structures** *noun, pl.*
پێکهاتە بەشدارەکان ◌ ساختارهای سهیم

**contribution** /ˌkɒntrɪˈbjuːʃn, US ˌkɑːn-/ *noun*
1 یارمەتی، پیتاک، باروبۆ، باربوو، کۆمەک، یاریدە: *a substantial contribution* 2 پێدان، بەخشین 3 مووچەی خانەنشینی 4 وتار، نووسراوە، نقیسار، مۆار، بابەت 5 بەش، پشک 6 ڕۆڵ 7 بەشداری، تەقلی بوون، هاوبەشی، پشکداری، دەس‌گرتن، پەلگرتن، یارمەتی‌دان 8 حەول، تێکۆشان ◌ 1 کمک، اعانه 2 اعطا 3 حق بازنشستگی 4 مقاله، نوشته، مطلب 5 سهم 6 نقش 7 معاضدت، مشارکت 8 کوشش

**contributor** /kənˈtrɪbjətə(r)/ *noun*
1 یارمەتی‌دەر، پیتاک‌دەر، کۆمەک‌کەر، دەسگر، بەدەنگەوەبوو 2 نووسەر، وتارنووس 3 بەشداری‌کەر، بەشدار 4 هۆ، مایە ◌ 1 کمک‌کننده، اعانه‌دهنده 2 نویسنده 3 شرکت‌کننده 4 علت

**contributory** /kənˈtrɪbjətəri, US -tɔːri/ *adjective*
1 یارمەتی‌دەر، یاریدەدەر، بەشدار 2 کاریگەر 3 هۆ، مایە ◌ 1 کمک‌کننده، سهیم 2 مؤثر 3 موجب

**con trick** = confidence trick

**contrite** /ˈkɒntraɪt, kənˈtraɪt, US ˈkɑːntraɪt/ *adjective*
پەشیمان، پاشگەز: *Her expression was a contrite* ◊ *a contrite criminal* ◊ *contrite apology* (contritely *adv*): لە ڕووی پەشیمانی‌یەوە، بە داخەوە: contriteness *n*: پەشیمانی، پاشگەزی) ◌ پشیمان، نادم

**contrition** /kənˈtrɪʃn/ *noun*
بەداخەوەبوون، پەشیمانی، تێشکان، تێکچوون، چرزان، خەمێکی قوول: *a look of contrition* ◌ تأسف، ندامت

**contrivance** /kənˈtraɪvəns/ *noun*
1 دەزگا، ئامێر، ئامراز، ئامووڕ، وەسیلە، ماشێن 2 داهێنان، تازەگەری، نوێگەری، چارەدۆزی، تەگبیر، مشوورخوازی، کارسازی، ڕێگادۆزینەوە 3 پلان‌دانان، بەرنامەدارێژی 4 فێڵ، تەڵەکە، دەهۆ 5 داهێنەری، توانایی داهێنان 6 دەرەقەت(هاتن)، توانایی، تابشت ◌ 1 ماشین، وسیله 2 اختراع، ابداع، ابتکار 3 طرح‌ریزی 4 ترفند، حقه 5 خلاقیت 6 توانایی

**contrived** /kənˈtraɪvd/ *adjective*
1 پلان(بۆ)دانراو 2 ساختە، هەڵبەستە، دەسکرد، نائاسایی، ناسروشتی، درۆ: *a contrived situation* ◌ 1 تدارک‌دیده‌شده 2 تصنعی

**control** /kənˈtrəʊl, US -ˈtroʊl/ *noun*
1 کۆنترۆڵ، مەهار(کاری)، ڕاگیری، ڕاگیرکاری، دەست‌بەسەرداگرتن، بەرگیری، پێش‌گیری، بەرگرتن، جڵەوگرتن: *A military junta took control of the country* ◊ *talks on arms control* 2 چاودێری، چاوبەسەری، پێراگەیشتن، پشکنین 3 دەسەڵات، ڕکێف، ئیختیار، دەس‌ڕۆیشتوویی، هێز 4 سنووورداری، دیاری‌کراوی 5 بەڕێ‌دابردن، هەڵسووڕاندن، بەڕێوەبردن 6 (کامپیوتێر) کلیلی کۆنترۆڵ 7 کلیل، دوگمە، قرتە، جەڕ، پێچ (تەلەفزیۆن و ڕادیۆ) 8 (لە ماشێن‌دا) فەرمان ◌ 1 کنترل، مهار، جلوگیری 2 مراقبت، نظارت، بازدید، رسیدگی 3 سلطه، قدرت، اختیار 4 محدودیت 5 اداره 6 کلید کنترل 7 کلید، پیچ 8 فرمان

**control key** *noun*
(کامپیوتێر) کلیلی کۆنترۆڵ ◌ کلید کنترل

**controllable** /kənˈtrəʊləbl, US -ˈtroʊ-/ *adjective*
لەراگیرهاتوو، دابین دەکرێ، مەهار دەکرێ، مەهارکردەنی، لەمەهارهاتوو، دەستی بەسەردا دەگیرێ ◌ مهارشدنی

**controlled** /kənˈtrəʊld, US -ˈtroʊld/ *adjective*
1 سنووردارکراو، دیاری‌کراو: *controlled airspace* 2 لەژێرچاودێری، لەژێر کۆنترۆڵی 3 لەسەرەخۆ، نارام، خوددار، هێمن: *She remained quiet and -olled* (-controlled) 4

زۆرتر لە لێکدانا): *a British-controlled computer-controlled systems* ◊ *company* ۞ 1 محدودشده 2 تحت نظارت 3 خونسرد 4 (بیشتر در ترکیب) تحت کنترل

**controlled experiment** *noun*
تاقیکردنەوەی کۆنترۆڵکراو ۞ آزمایش کنترل‌شده

**controlled substance** *noun*
بەنگی ناقانوونی، کەرەسە یان سابستەنسی کۆنترۆڵکراو (دەرمانی کە بێ دەستووری پزشک نابێ بەکاربێنرێ) ۞ مواد کنترل‌شده

**controller** /kən'trəʊlə(r), US -'troʊ-/ *noun*
1 بەڕێوەبەری (کاروباری) دارایی، چاودێری خەرج‌وبار (هەروەها comptroller) 2 دەزگای میزان(کردن)، مەهارە، میزانە(ک)، تەرازینە ۞ 1 مدیر امور مالی 2 دستگاه تنظیم

**controllership** /kən'trəʊlʃɪp/ *noun*
چاودێری ۞ نظارت

**controlling interest** *noun*
بەشە یان ستاکە دیاریکەرەکان، پشکە دیاریکەرەکان (= ئەو بەشانەی کە هێزی بڕیاردان دەدەن بە خاوەنەکەی) ۞ سهام فائقه

**control panel** *noun*
ڕووتەختی کۆنترۆڵ ۞ صفحه‌ی کنترل

**control room** *noun*
ژووری کۆنترۆڵ ۞ اتاق کنترل

**controls** *noun, pl.*
1 کەل‌وپەلی دەس‌بەسەراگرتن یان کۆنترۆڵ یان مەهار 2 دەزگا 3 سوێچ و دوگمەکان، دوگمەکانی کۆنترۆڵ یان مەهار 4 دەزگاکانی میزانکردن یان کۆنترۆڵ ۞ 1 وسایل مهار 2 دستگاه 3 سویچ و دکمه‌ها 4 دستگاه‌های تنظیم

**control tower** *noun*
کەلوو یان برجی چاودێری (فڕۆکەخانە) ۞ برج مراقبت

**controversial** /ˌkɒntrə'vɜːʃl, US ˌkɑːntrə'vɜːrʃl/ *adjective*
مشت‌ومڕلەسەر، کێشەلەسەر، کێشەبار، کێشاوی، کێشەبەدوا، کێشەون: *a controversial policy* ◊ *a -oversial film* ۞ مورد اختلاف، بحث‌انگیز

**controversial issues** *noun, pl.*
پرسە کێشەبەدوا یان مشت‌ومڕلەسەرەکان، پرسە کێشەلەسەرەکان ۞ مسائل مورد اختلاف

**controversialist** *noun*
مشت‌ومڕپێخۆش، فێرەمشت‌ومڕ، مشت‌ومڕباز، ئەهلی مشت‌ومڕ، بەشداریکەر لە مشت‌ومڕدا ۞ اهل جر و بحث

**controversially** /-ʃəli/ *adverb*
مشت‌ومڕلەسەرانە، بە شێوەیێکی کێشەبەدوا یان کێشەبار ۞ به طور بحث‌انگیز

**controversy** /'kɒntrəvɜːsi, BrE also kən'trɒvəsi, US 'kɑːntrəvɜːrsi/ *noun, pl.* controversys
1 مشت‌ومڕ، کێشە، جووڕە، شەڕەقسە، قڕەقڕ، بگرەوبەردە، سێ‌ودوو 2 ناکۆکی، دژایەتی ۞ 1 مناقشه، مشاجره، جر و بحث 2 اختلاف

**contumacious** /ˌkɒntju'meɪʃəs, US ˌkɑːntu-/ *adjective*
سەرێزێو، یاغی، یاخی، سەرکێش، ئەشقی، rebellious ۞ متمرد، سرکش، طغیان‌گر

**contumaciously** /ˌkɒntju'meɪʃəsli, US ˌkɑːntu-/ *adverb*
سەرێزێوانە، یاغی‌یانە ۞ متمردانه

**contumacy** /'kɒntjʊməsɪ US kən'tuːməsɪ/ *noun, pl.* contumacies
سەرێزێوی، یاغیگەری، مل‌بادان، سەرچەوتی، سەرکێشی، سەرپێچی، ئینادا ۞ تمرد، طغیان‌گری

**contumelious** /ˌkɒntjʊ'miːlɪəs/ *adjective*
1 بێ‌ڕێزی‌پێکەر، سووکایەتی‌پێکەر، ئابڕووبەرە 2 سووکانە 3 لووت‌بەرز، بەفیز، بەدەمار (contumeliously /ˌkɒntjʊ'miːlɪəsli/ *adv*: لە ڕووی سووکی‌یەوە، سووکانە) ۞ 1 اهانت‌کننده 2 اهانت‌آمیز 3 مغرور

**contumely** /'kɒntjuːmli, US -tjuːmli/ *noun, pl.* contumelies
بێ‌ڕێزی، بێ‌حورمەتی، سووکایەتی، ئابڕووبردن، جنێوپێدان ۞ اهانت، بی‌احترامی، هتک حرمت

**contusion** /kən'tjuːʒn, US -'tuː-/ *noun*
شین‌بوونەوە، ڕەش‌بوونەوە، کەووبوون(ەوە)، خوێن‌تێزان ۞ کبودشدگی

**conundrum** /kə'nʌndrəm/ *noun, pl.* conundrums
1 مامک، مەتەڵ، لیچار، riddle 2 گرفتی سەخت، ئاستەنگی، گیروگرفت، گیروگرفت یان پرسی چارەنەکراو (بێ‌چارەسەر)، کێشەی ئاڵۆز ۞ 1 معما 2 مشکل یا مسأله‌ی لاینحل، معضل

**conurbation** /ˌkɒnɜː'beɪʃn, US ˌkɑːnɜːr'b-/ *noun*
(فەرمی) کۆمەڵەی شاری، کۆشار، شاران ۞ منظومه‌ی شهری

**conure** /'kɒnjʊə/ *noun*
کلک‌قووچکە (جۆرێ parakeetی ئەمریکای باشووری و ناوەندی [*Pyrrhura Aratinga* و توخمەکانی تر]) ۞ نوعی طوطی

**conus** /'kəʊnəs/ *noun, pl.* coni /-naɪ/
1 (توێکاری) قووچکە: (هەروەها conus arteriosus /ɑːˌtɪərɪ'əʊsəs/) بەشی سەرووی پێشەوەی زگۆڵەی دڵی لای ڕاست (هەروەها conus arteriosus) 2 قووچکە: (هەروەها conus medillaris /ˌmɛdə'lɑːrɪs/) نووکی خوارووی قووچەکی مۆخی بڕبڕە (هەروەها conus medullaris، بنەڕەت: لە لاتینەوە بە

واتای "قووچکه cone") ◌ کونوس

**convalescence** /ˌkɒnvəˈlesns, US ˌkɑːn-/ *noun*

1 تازەلەجیٚ‌هەستانەوە، چاکبوونەوە، بووژانەوە، بەرەوچاکبوونەوە، هەستانەوە، قەترسین 2 ماوەی هەستانەوە ◌ 1 نقاهت 2 دورەی نقاهت

**convalescent** /ˌkɒnvəˈlesnt, US ˌkɑːn-/ *adjective, noun*

*n* سەربە تازەلەجیٚ‌هەستانەوە، بووژانەوەیی، هەستانەوەیی *adj* نەخۆشی تازەلەجیٚ‌هەستاو، نەخۆشی رووڵەچاکی یان بووژاوە ◌ *n* وابستە بە نقاهت *adj* بیمار در حال بهبودی

**convalescent home** *noun*, also convalescent hospital

بووژانگە ◌ نقاهت‌خانە

**convection** /kənˈvekʃn/ *noun*

(فیزیک) هەڵگرتن یان راگویستن (گەرمی)، هاوهەڵگری، راگویستنی گەرما (لە شلەدا)، گەرمی‌بەری، گەرمی‌راگوێزی، گەرمی‌هەڵگری (بنەڕەت: لە late Latin *convectio(n-)* بنەڕەت: لە *convehere* لاتین، لە *con-* "هاو، پێکەوە" *vehere* + "together" "هەڵگرتن "carry") ◌ همرفت

**convectional** *adjective*

هاوهەڵگری‌یانە، سەربە گەرمی‌هەڵگری، گەرمی‌هەڵگری‌یانە، گەرمی‌راگوێزی‌یانە، گەرمی‌بەری‌یانە ◌ وابستە بە همرفت

**convection current** *noun*

تەوژم یان تەزووی گەرمی‌هەڵگری یان هاوهەڵگری ◌ جریان همرفت

**convection rain** *noun*

بارانی گەرمی‌هەڵگری یان گەرمی‌بەری ◌ باران همرفت

**convector** /kənˈvektə(r)/ *noun*, also convector heater

1 دەزگای گەرمی‌هەڵگر یان گەرمی‌بەر، دەزگای هاوهەڵگر 2 کووره‌ی پانکەدار ◌ 1 همرفتگر 2 بخاری فن‌دار

**convenance** /ˈkɒnvəˌnɑːns/ *noun*

ڕێوشوێنی هەڵس‌وکەوت یان کۆمەڵگا ◌ آیین معاشرت

**convener** /kənˈviːnə(r)/ *noun*, also convenor

1 لێ‌گیرەوە، بانگهێشتکەر، بانگهێشت‌چی 2 ڕێکخەر، سازدەر، لەدارخەر 3 نوێنەری یەکێتی (کارگە یان شوێنەکانی تری کار) 4 نوێنەر (پارتی و هتد) ◌ 1 دعوت‌کنندە 2 برگزارکنندە 3 نمایندەی اتحادیە 4 نمایندە

**convenience** /kənˈviːniəns/ *noun*, also conveniency

1 ئاسوودەیی، حەساوەیی، رابواردن، تەناهی، ئاسایش، ژین‌فرەهی، ژیان‌خۆشی، خۆش‌گوزەرانی 2 ئاسانی، ئاسان‌کاری 3 کەلوپەلی حەسانەوە، هۆی ئاسایش(ت) 4 بەکارهێنان، کەڵک‌لێ‌وەرگرتن 5 خواپێداوی، ڕێزەن، نیعمەت، بەهرە 6 دەرفەت یان وەختی باش 7 قازانج، سوود، بەرژەوەندی 8 ئاودەس‌خانەی گشتی، دەسبەئاوی هەموان ◌ 1 راحتی، رفاه 2 سهولت 3 تسهیلات 4 استفاده 5 مناسب 6 نعمت، موهبت 7 فرصت یا وقت مناسب 8 نفع 9 توالت عمومی

**convenience food** *noun*

خوراک یان چێشتی ئامادە ◌ غذای پیش‌پخته

**convenient** /kənˈviːniənt/ *adjective*

ئاسان، سانا، ئاسوودە، راحەت، حەساوە، لە ئاسایش‌دا، بەقازانج، بەسوود، لەبار، کارخۆش، گونجاو ◌ سهل، راحت، مفید، مناسب

**conveniently** /kənˈviːniəntli/ *adverb*

بە ئاسوودەیی ◌ به راحتی

**convent** /ˈkɒnvənt, US ˈkɑːnvent, -vənt/ *noun*

1 دەیر (ب.ت. هی ژنە رەبەنەکان) 2 دەیرنشینەکان، (دەستە) رەبەنەکانی دەیر، کۆمەڵی رەبەنان 3 کۆبوونەوە، کۆم‌جڤین، جڤین، خڕبوونەوە، کۆمەڵە ◌ 1 صومعه 2 جماعت راهبان صومعه 3 اجتماع، میتینگ، انجمن

**conventicle** /kənˈventɪk(ə)l/ *noun*

1 کۆبوونەوە 2 کۆبوونەوەی نهێنی ◌ 1 گردهمایی 2 گردهمایی سری

**convention** /kənˈvenʃn/ *noun*

1 دانیشتن، کۆبوونەوە، کۆنگرە، کۆنفرانس، کۆمبین، جڤین، کۆڕبەستن 2 بڕیارنامە، ڕێککەوتن‌نامە، پەیمان، پەیمان‌نامە 3 نەریت، عورف، دەستوور، باوە، ڕێ‌وشوێن (کۆمەڵایەتی)، کەڤنەشوێن، داب‌ونەریت، ڕێ‌ورەسم، دەستوور، شێواز یا ڕێچکەی ترادیسۆناڵ ◌ 1 اجلاس، کنگره، گردهمایی 2 قرارداد، توافق‌نامه، میثاق 3 سنت، عرف، رسم، آداب و رسوم

**conventional** /kənˈvenʃənl/ *adjective*

1 باو، داب، ئاسایی، بەپێی دەستووری کۆن، خۆماڵی، commonplace ،ordinary 2 نەریتی 3 لەمێژینە، کۆن 4 ناناوکی، نانیوکی، ئاسایی (چەک‌وچۆڵ: *conventional warfare*) 5 پەیمانی، پەیمان‌نامەیی 6 کۆبوونەوەیی، کۆنگرەیی ◌ 1 مرسوم، متداول، عادی 2 سنتی 3 قدیمی 4 متعارف 5 قراردادی 6 وابسته به کنگره

**conventionalism** *noun*

پەیمان‌گەری، پەیمان‌خوازی ◌ میثاق‌گرایی

**conventionalist** *noun*

پەیمان‌گەر، پەیمان‌خواز ◌ میثاق‌گرا

**conventionality** /kənˌvenʃəˈnæləti/ *noun*,

*pl.* conventionalities
1 نەریتگەری، نەریتباوەری 2 رەسم، داب، دەستوور، لایەنی نەریتی، ریسا ◌ 1 سنتگرایی 2 رسم، جنبەی سنتی، قاعده
**conventionally** /-ʃənəli/ *adverb*
ئاسایی، بە شێوەیەکی نەریتی، نەریتانە: - *entionally dressed* ◌ معمولی، به طور سنتی
**conventional medicine** *noun*
پزشکی نەریتی (شێوەیەکی ئاسایی پزشکی لە زۆربەی ئەوروپا و ولاتانی ئەمریکای باکووری) ◌ پزشکی سنتی
**conventioneer** /kən͵venʃə'nɪə(r)/ *noun*
1 ئەندامی کۆنگرە 2 نەریتپەرست، نەریتخواز، نەریتباوەر ◌ 1 عضو کنگره 2 سنتگرا
**convent school** *noun*
خوێندنگای کچان (لە لایەن ژنەرەبەنەکانەوە بەرێوەدەبرێ) ◌ مدرسەی مذهبی
**conventual** /kən'ventʃʊəl/ *adjective, noun*
*adj* خانەقایی، سەربە دەیر، *n* monastic رەبەن، ئەندامی دەیر یا کەسێ کە لەوێ دەژی (conventually *adv*) ◌ *adj* وابسته به صومعه *n* راهب
**convergence** /kən'vɜːdʒəns US kən'vɜːdʒənsi/ *noun*
1 یەکگیری، هاوگری، هاوگیری، یەکگرتنەوە 2 لێکنزیکی، لێکنزیکبوونەوە 3 چوونەوسەریەک، سەریەککەوتن، سەریەکهاتەیی، پێکگەیشتن، خاڵی پێکگەیشتن، جەمسەر، خاڵی سەریەکچوون 4 یەکێتی، یەکگرتوویی، یەکپارچەیی 5 (زیندەناسی) لێکچوونی پێکهاتەیی لە زیندەوەر یان ئۆرگانیزمە ناپێوەندیدارەکان کە بە هۆی گوشار یان پاڵەپەستۆی ژینگەیییەوە پێکهاتووە ◌ 1 همگرایی 2 تقارب 3 انطباق، نقطەی تلاقی 4 اتحاد 5 کانورجنس
**convergent** /kən'vɜːdʒənt/ *adjective*
1 یەکگرەوە، یەکگیر، هاوگر، سەریەکهاتە 2 لێکنزیک، پێکنزیک، پێکگەیشتوو، سەریەککەوتوو، سەریەکچوو، جەمسەرگیر، یەکترگیر ◌ 1 همگرا 2 متقارب، منطبق
**converging** *adjective*
1 یەکگرەوە، یەکگیر، هاوگر: *converging lens* 2 لێکنزیک، پێکنزیک، پێکگەیشتوو ◌ 1 همگرا 2 متقارب
**conversable** /kən'vɜːsəbl/ *adjective*
قسەخۆش، قسەشیرین، دەمشیرین، بەراوێژ ◌ خوشصحبت
**conversance** /kən'vɜːsns, US -'vɜːrs- *noun*, also conversancy
1 ئاگاداری، شارەزایی، بەڵەدی 2 ناسیاوی، ئاشنایی ◌ 1 اطلاع 2 آشنایی

**conversant** /kən'vɜːsnt, US -'vɜːrs-/ *adjective*
1 ئاگادار، بەئاگا، شارەزا، بەڵەد 2 ناسیاو، شناس، ئاشنا ◌ 1 مطلع 2 آشنا
**conversation** /͵kɒnvə'seɪʃn, US ͵kɑːnvər's-/ *noun*
1 (نافەرمی) قسەکردن، پەیڤین، دوان، دوو، دراو، قسە، دەمەتەقێ، ئاخافتن، هاوپرسی، هاوبێژی، وتوویژ، دانوستان 2 نزیکی، گان، جووتبوون ◌ 1 گفتوگو، صحبت، مذاکره 2 جماع
**conversational** /͵kɒnvə'seɪʃənl, US ͵kɑːnvər's-/ *adjective*
سەربە قسەکردن یان پەیڤین، دەمەتەقێیی، قسەخۆش، قسەشیرین ◌ وابسته به صحبت کردن، خوشصحبت
**conversationalist** /͵kɒnvə'seɪʃənəlɪst, US ͵kɑːnvər's-/ *noun*
قسەزان، زمانپاراو، بەدەم، بەدەمودوو، بەدەموپل، دەمگەرم، بدوو، دیوەخانگیر، پێژا ◌ مجلسآرا، آدم خوشصحبت
**conversazione** /͵kɒnvəsætsɪ'əʊneɪ/ *noun, pl.* conversaziones or -ni
کۆڕێ بۆ وتوویژ لەسەر وێژە و هونەر ◌ کونورسازیونی
**converse**[1] /'kɒnvɜːs, US 'kɑːnvɜːrs/ *noun*
قسەکردن، پەیڤین، دووان، دەمەتەقێ، ئاخافتن ◌ صحبت
**converse**[2] /'kɒnvɜːs, US 'kɑːnvɜːrs/ *adjective, noun*
*adj* پێچەوانە، دژ، بەرقازی، ئاوەژوو *n* شتی ئاوەژوو ◌ *adj* عکس، خلاف، ضد *n* چیز معکوس
**conversely** /'kɒnvɜːsli, US 'kɑːnvɜːrs-/ *adverb*
پێچەوانە، بەپێچەوانە ◌ برعکس
**conversion** /kən'vɜːʃn, US -'vɜːrʒn, -ʃn/ *noun*
1 گۆڕین، گۆڕان: *the conversion of farm buildings into family homes* 2 سەروبن کردن، هەڵگێڕانەوە، ئاوەژووکردنەوە 3 گۆڕینی دین یان ئایین، دینگۆڕی، هەڵگەڕانەوە، بادانەوە، گۆڕینی بیروباوەڕ: *the conversion of the Anglo-Saxons by his conversion* ◊ *Christian missionaries from Judaism to Christianity* 4 دەسپیاهێنان یا دەسکاری خانووبەرە 5 لێدزین، داگیرکردن، پێەدانەوە 6 (لۆژیک) پێچەوانە، ئاوەژوو 7 (راگبی) گۆڵ 8 گۆڕینی مادە یان ماکێکی تیشکدەر radioactive material بۆ مادەیێکی تر بە گرتنی نیوترۆن 9 گۆڕانی واتای وشە (ب.ن. لە ناوەوە ناوەڵناو بۆ ناو) 10 (ماف) گۆڕینەوە یان ئاڵوگۆری قەرزێ بە قەرزێکی تر

11 (دەروونناسی) گۆڕین ۞ 1 تبدیل، تغییر 2 تقلیب 3 تغییر دینی، نوکیشی، نوگروی، تغییر عقیده 4 تغییر ساختمان 5 اختلاس 6 عکس (منطق) 7 گل 8، 9 و 10 کونورسیون 11 (روانشناسی) تبدیل

**conversion disorder** *noun,* also conversion hysteria or conversion reaction
جۆری دەروونشێواوی psychoneurosis کە لەودا نیشانەکانی جەستەیی و لەشی (وەک شەپلە یان لەسمی پەلەکان paralysis of the limbs) بەبێ بنەڕەتێکی فیزیکی دەردەکەوێ؛ دەرکەوتنی تێکچوونێکی هۆشی و مێنتاڵ وەک نەخۆشی و ناسازی لەشی و فیزیکی ۞ کونورسیون دیس‌اوردر

**conversion factor** *noun*
(کیمیا) فاکتێر (کۆلکە)ی گۆڕین ۞ ضریب تبدیل

**convert** /'kɒnvɜːt, US 'kɑːnvɜːrt/ *noun*
نوێ‌دین، نۆدین، نۆئایین، نۆباوەڕ: *a convert to Islam* ۞ نوکیش، نوآیین

**converted** *adjective*
گۆڕاو ۞ تبدیل‌شده، تغییریافته

**converter** /kən'vɜːtə(r), US -'vɜːrt-/ *noun,* also convertor
(فیزیک) گۆڕینەر، گۆڕەر، بگۆڕ، گۆڕەک ۞ مبدل

**convertibility** /kən͵vɜːtə'bɪləti, US -͵vɜːrt-/ *noun*
لەگۆڕینهاتوویی ۞ تبدیل‌پذیری

**convertible[1]** /kən'vɜːtəbl, US -'vɜːrt-/ *adjective*
لەگۆڕینهاتوو، دەگۆڕێت ۞ تبدیل‌پذیر

**convertible[2]** /kən'vɜːtəbl, US -'vɜːrt-/ *noun*
ماشێنی سەر(یان میچ)قەدکراو، ماشێنی میچ‌نووشتاو ۞ اتومبیل کروکی

**convex** /'kɒnveks, US 'kɑːn-/ *adjective*
قۆقز، دەرپەڕیو، زەق، رووچەم، رووقیت، کوورک (بنەڕەت: لە *convexus* لاتین "arched ,vaulted") ۞ کوژ، محدب

**convexity** /kɒn'veksəti, US kɑːn'v-/ *noun, pl.* convexities
قۆقزی، دەرپەڕیوی، رووقیتی، رووچەمی، زەقایی ۞ کوژی، تحدب

**convexly** /'kɒnveksli, US 'kɑːn-/ *adverb*
قۆقزانە، بە شێوەیەکی قۆقز ۞ بە طور کوژ

**convexness** /'kɒnveksnəs, US 'kɑːn-/ *noun*
قۆقزی، دەرپەڕیوی، رووچەمی، رووچەماوی ۞ کوژی

**convexo-concave** *adjective*
قۆقز-رووچاڵ ۞ مقعر-محدب

**convexo-convex** *adjective*
دوولاقۆقز، دوولادەرپەڕیو ۞ محدب‌الطرفین

**conveyable** /kən'veɪəbl/ *adjective*
شیاوی هەڵگرتن، لەهەڵگرتنهاتوو، راگوێستەنی، رادەگوێزرێ، دەگوازرێتەوە، دەبردرێ، هەڵدەگیرێ ۞ قابل حمل

**conveyance** /kən'veɪəns/ *noun*
1 گواستنەوە، راگوێستن، گوێزانەوە، راکێشان، کێشان، بردن، ناردن، شاندن، هەڵگرتن، گەیاندن 2 راگوێزە، ماشێن 3 (ماف) بەنێوکردن، راگوێستن 4 قەباڵەی بەناوکردن یان راگوێستن، تاپۆ، راگوێستن‌نامە ۞ 1 انتقال، رسانش، حمل، ارسال 2 وسیلەی نقلیە 3 واگذاری 4 سند انتقال

**conveyancing** /kən'veɪənsɪŋ/ *noun*
(ماف) بەناوکردن، راگوێستن (ماڵ و دارایی) ۞ انتقال

**conveyor** /kən'veɪə(r)/ *noun,* also conveyer
1 ماشێن، راگوێزەر 2 (ماف) بەنێوکەر، راگوێزەر 3 قایش یا تەسمەی راگوێستن، بەندی راگوێستن ۞ 1 وسیلەی نقلیە 2 انتقال‌دهندە 3 نوار نقالە

**conveyor belt** *noun*
قایشی راگوێستن، بەند یان تاسمەی راگوێستن، باریکەی گوێزانەوە ۞ تسمەی نقالە

**convict** /'kɒnvɪkt, US 'kɑːn-/ *noun*
خەتابار، گوناهبار، تاوانبار، زیندانی، مەحکووم، سزالەسەر: *an escaped convict* ۞ مقصر، مجرم، زندانی، محکوم

**conviction** /kən'vɪkʃn/ *noun*
1 تاوانبارکردن، گوناهبارکردن، مەحکوومیت، سزالەسەری، تاوانباری، گوناهباری، خەتاباری 2 باوەڕی پتەو، بڕوای تۆکمە 3 بەرایی، رازی‌کردن، قایل‌کردن 4 باوەڕ، بایەخ، دڵنیایی، تێڕادیتن، باوەڕپێکراوی (convictive /kən'vɪktɪv/ *adj*: مەحکوومکەر، سزادانەر) ۞ 1 تجریم، محکومیت، مجرمیت 2 عقیدەی راسخ 3 متقاعد ساختن 4 اعتبار، اطمینان

**convinced** /kən'vɪnst/ *adjective*
1 رازی‌بوو، پێ‌سەلمێنراو، قایل(بوو) 2 دڵنیا 3 بەبڕوا، بەباوەڕ، بڕوادار، باوەڕمەند: *a convinced Christian* ۞ 1 متقاعد، مجاب 2 مطمئن 3 مؤمن

**convincible** *adjective*
قایل دەکرێ، بەرایی دێ، رازی دەبێ ۞ متقادشدنی

**convincement** /kən'vɪnsmənt/ *noun*
مەحکوومیەت، تاوانباری، گوناهباری ۞ محکومیت

**convincing** /kən'vɪnsɪŋ/ *adjective*
قایل‌کەر، بڕا، بەبڕ، بەرایی‌دەر، سەلمێنەر، رازی‌کەر: *a convincing explanation/case* ◊ *a convincing argument* (convincingly /kən'vɪnsɪŋli/ *adv*: قایل‌کەرانە، سەلمێنەرانە،

بە شێوەیێ کە بڕ بکا: *Her case was* ◊ *convincingly argued They won* (*convincingly*) ۞ متقاعدکننده

**convivial** /kən'vɪviəl/ *adjective*
دۆستانە، بەزمی، بەزموڕەزم(ئاسا)، سوورئاسا، خۆش، گەرموگوڕانە، لەدڵەوەنزیک: *a convivial gathering* ◊ *a convivial evening* ◊ *a convivial atmosphere* (convivially /kən'vɪviəli/ *adv*) ۞ دوستانه، سورمانند، صمیمی

**conviviality** /kən,vɪvi'æləti/ *noun*
دۆستایەتی، بەزموڕەزم، بەزم، گەرم وگوڕی، لەدڵەوەنزیکی ۞ سورچرانی، صمیمیت

**convocation** /,kɒnvə'keɪʃn, US ,kɑ:n-/ *noun*
1 بانگێشتن، بانگهێشت، بانگ کردن، لێ گێڕانەوە 2 کۆڕ 3 کۆڕی پیاوانی ئایینی 4 ڕێوڕەسمی دەرچوونی زانکۆ 5 ڕێوڕەسمی فەرمی بۆ پێدانی خەڵاتەکانی زانکۆ 6 کۆبوونەوەی فەرمی (ب.ت. دەستەی قانوونداندەرانی کلێسەی ئینگلتەرە یان ئاهەنگی دەرچوونی هێندێ زانکۆ) 7 کۆڕی کلێسە (convocational *adj*) ۞ 1 فراخوانی، احضار 2 مجمع 3 مجمع روحانیون 4 مراسم فارغ‌التحصیلان دانشگاه 5 مراسم رسمی اعطای جوایز دانشگاه 6 گردهمایی رسمی 7 مجمع کلیسا

**convocator** *noun*
بانگێشت‌کەر، لێ گێڕەوە ۞ دعوت‌کننده

**convolute** /'kɒnvəlu:t/ *adjective*
پێچ‌دراو، پێچ‌هەڵدراو، لوول‌دراو، بادراو ۞ پیچ‌خورده

**convoluted** /'kɒnvəlu:tɪd, US 'kɑ:n-/ *adjective*
1 پێچ‌دراو، لوول‌دراو، بادراو، هەڵپێچراو، پڕچین، پێچاوپێچ، پێچ‌پێچ، بەپێچ‌وپەنا، پێچەڵاوپێچ، خواروخێچی، قەف‌وپێچاوی، چڕچ‌ولۆچ، لارەولار، دەوروپێچ، قەدقەد، لاسەرلا، چرچ، پۆت، خوز: *a convoluted coastline* 2 ئاڵۆز، تێگەیشتن سەخت، دژوار، intricate ،involved: *a convoluted argument* ◊ *a book with a convoluted plot* (convolutedly *adv*: 1 پێچ‌دراوانە، لوول‌دراوانە، بادراوانە، پێچاوپێچانە، پێچەڵاوپێچانە، خواروخێچانە، بە شێوەیێکی لاسەرلا یا چرچ 2 ئاڵۆزانە، سەختانە، دژوارانە) ۞ 1 پیچ‌خورده، پرچین و شکنج 2 پیچیده

**convoluted tubule** *noun*
لوولەچەی پێچاوپێچ: بە شێکی nephron گورچیلە کە میز دەخەستێنێ و هاوسەنگی و تەرازی خوێ و ئاو رادەگرێ ۞ کونولیوتید تیوبیول

**convolution** /,kɒnvə'lu:ʃn, US ,kɑ:n-/ *noun*
1 چرچ‌ولۆچی، لاسەرلایی، پێچ‌وپەنا، قەف‌وپێچ، قەد، پێچ، کۆل، لوول، لۆچ، چالی‌وچۆڵی (مێشک)، پێچ‌خواردوویی، بادراوی، لوول‌دراوی، پێچ‌دراوی، ئاڵقەدراوی، ئاڵقە، قەف 2 پێچەڵاوپێچی، ئاڵۆزی، دژواری، گرانی (convolutional *adj*) ۞ 1 چین و شکنج، چین، پیچ، حلقه 2 پیچیدگی

**convolvulus** /kən'vɒlvjələs, US -'vɑ:lv-/ *noun, pl.* convolvuluses
لاولاو، دارپێچ، لاولاوەپێچ [تۆخم *Convolvulus*] ۞ نیلوفرپیچ

**convoy** /'kɒnvɔɪ, US 'kɑ:n-/ *noun*
1 کاروان، ستوون 2 کاروانی دەریایی 3 پارێزوان، پاسەوان، نۆبەدار، پارێزەر 4 بەڕێ کردن، ڕەوانە(کردن)، لەگەڵ چوون ۞ 1 قافله، کاروان 2 کاروان دریایی 3 اسکورت 4 مشایعت

**convulsed** *adjective*
گرژ، شێواو، ئۆقرەلێ‌هەڵگیراو (convulsedly *adv*) ۞ متشنج، بی‌قرار

**convulsion** /kən'vʌlʃn/ *noun*
1 گەشکە، گرژی، کرژبوون، ماسوولەکەرەقێ 2 (خوازە) شێوان، شڵەژان، ناژاوە، شڵەقان 3 پێران، پێکەنینی زانپێکەر و ولکبڕ یان لەسەریەک ۞ 1 تشنج، تکان 2 آشوب 3 خنده‌ی رودەبرکننده، ریسه

**convulsionary** /kən'vəlʃənerɪ/ *adjective*
گرژی‌یانە، گەشکەیی، پێوەندی بە گەشکەوە هەیە ۞ تشنجی

**convulsive** /kən'vʌlsɪv/ *adjective*
1 گرژێنەر، مایەی گەشکە، گەشکەهێن(ەر) 2 خۆنەویستە، کۆنترۆڵنەکراو: *a convulsive movement/attack/fit* ◊ *Her breath came in convulsive gasps* 3 شڵەقێنەر، شڵەژێنەر، مایەی شڵەقان (convulsively /kən'vʌlsɪvli/ *adv*: خۆنەویستانە، هەڵلەرزیو؛ convulsiveness /kən'vʌlsɪvnəs/ *n*) ۞ 1 تشنج‌زا 2 غیرارادی 3 کانولسیو

**cony** /kəʊnɪ/ *noun, pl.* conies
1 کەروێشک، کەرۆشک [*Oryctolagus cuniculus*] 2 فەروە، پێستە یان کەوڵی کەروێشک ۞ 1 خرگوش 2 پوست خرگوش

**coo** /ku:/ *noun, interjection*
*n* دەنگی گمەگم (کۆتر)، بەق‌بەقوو، وەق‌وەقوو *interj* تەح، پیاح، بەح: *Coo, look at him!* ۞ *n* بغ‌بغو *interj* ای وای

**cooing** *noun*
1 گمەگم، بەق‌بەقوو، وەق‌وەقوو 2 سرتەسرت، سرت‌وهۆڕ، چپەچپ ۞ 1 بغبغو 2 پچ‌پچ

**cook** /kʊk/ *noun*

ئاشپەز، چێشتکەر، نانکەر، چێشتلێنەر: *She was employed as a cook in a hotel* (بنەڕەت: لە *coquus* لاتین) ◇ آشپز

**cookbook** /'kʊkbʊk/ *noun*

کتێبی چێشتلێنان ◇ کتاب آشپزی

**cooked** *adjective*

لێنراو، سازکراو ◇ پخته

**cooker** /'kʊkə(r)/ *noun*

1 گاز (چێشت لەسەرنان) 2 (نافەرمی) سێو یان میوەی تری بۆ لێنان (هەتا بە کاڵی خواردن) ◇ 1 اجاق گاز 2 کوکر

**cookery** /'kʊkəri/ *noun, pl.* cookeries

1 پەزان، ئاشپەزی، دەسوپوخت، هونەری چێشتلێنان: *Italian -okery ◊ a -ery course* 2 (ئەمریکا) = kitchen ◇ آشپزی، هنر آشپزی

**cookery book** *noun*

کتێبی چێشتلێنان ◇ کتاب آشپزی

**cookhouse** /'kʊkhaʊs/ *noun*

چێشتخانە (لە دەرەوەی ماڵ، بۆ نموونە سەربازگەی لەشکری) ◇ آشپزخانە

**cookie** /'kʊki/ *noun, pl.* cookies

1 غوراِبی، توشە 2 پیاو، کابرا، کەس ◇ 1 بیسکویت 2 شخص، آدم

**cooking** /'kʊkɪŋ/ *noun*

1 لێنان، سازکردن، دروسکردن، پەزان 2 بابەتی چێشتلێنان 3 بۆلێنان باش ◇ 1 آشپزی 2 مخصوص آشپزی 3 مناسب پختن

**cooking apple** *noun*

سێوی لێنان (بۆ لێنان دەبێ تا ئەوەی کە بە کاڵی بخورێ) ◇ سیب پختن

**cooking gas** = Calor gas

**cooking oil** *noun*

رۆنی (چێشت)لێنان (رۆنی گوڵەبەڕۆژە و زەیتوون) ◇ روغن آشپزی

**cookout** /'kʊkaʊt/ *noun*

کۆکەوت (چێشتلێنان لە دەرەوە) ◇ پیکنیک

**cookshop** /'kʊkʃɒp, US -ʃɑ:p/ *noun*

دووکانی چێشتلێنان ◇ مغازەی آشپزی

**Cook's tour** *noun*

(نافەرمی) سەفەری بەپەلە لە زۆر شوێن ◇ کوکس تور

**cookware** /'kʊkweə(r), US -wer/ *noun*

قاپ و قاچاخی چێشتلێنان، حاجەتی ئاشپەزی ◇ ظروف آشپزی

**cooky** /kʊkɪ/ = cookie

**cool** /ku:l/ *adjective, noun*

*adj* 1 فێنک، فێنکایی، سارد، ساردکە، هوونک 2 ئارام، لەسەرەخۆ، کەمتەرخەم، ساردوسڕ 3 بێشەرم، روودار، بێحەیا، بێشەرمانە *n* 1 هەوای فێنک، فێنکایی 2 شوێن و جێی فێنک 3 ئارامی، هێمنی، لەسەرەخۆیی (coolly /'ku:lli/ *adv*: ساردوسڕانە، بە کەمتەرخەمییەوە، بە لەسەرەخۆییەوە؛ coolness /'ku:lnəs/ *n*: 1 فێنکی، ساردی 2 لەسەرەخۆیی، هێمنی 3 کەمتەرخەمی، نادەربەستی، گوێپێنەدان) ◇ *adj* 1 خنک، سرد 2 متین، بی تفاوت 3 بی حیا، وقیحانه *n* 1 هوای خنک 2 جای خنک 3 متانت

**coolant** /'ku:lənt/ *noun*

ساردکەرە، فێنککەرە (شلە، ب.ت. لە ڕیئاکتۆری ناوکیدا) ◇ خنککن

**cool bag** *noun*, also cool box

سنووقی ساردی ڕاگرتن (خۆراک و خواردنەوە) ◇ کولبگ

**cooler** /'ku:lə(r)/ *noun*

1 (نافەرمی) فێنککەرە 2 زیندان، بەندیخانە ◇ 1 کولر 2 زندان

**Cooley's anaemia** *noun*, also thalassaemia

کەمخوێنی کولیز یان کولی: جۆرێ کەمخوێنی سەختی تالاسیمیک (بنەڕەت: لە ناوی paediatrician ئەمریکی Thomas B. *Cooley*) ◇ نوعی بیماری

**cool-headed** *adjective*

ئارام، هێدی، لەسەرەخۆ ◇ خونسرد

**coolibah** /'ku:lɪbɑ:/ *noun*

جۆرێ درەختی ئەمریکای باکووری کە دارێکی زۆر سەختی هەیە [*Eucalyptus microtheca*] (لە Kamilaroi ـەوە) ◇ نوعی درخت

**coolie** /'ku:li/ *noun*

1 فەعلا، کۆلکێش، حەممال (وشەیەکی سارد و سووکە بۆ کەسێکی کرێکار لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات) 2 وشەیێکی سووکە بۆ کەسێ لە نیمچەوشکاری هیند یان ڕەگەزی هیندی ◇ 1 عمله 2 کولی

**coolie hat** *noun*

کڵاوی حەممال یان فەعلا ◇ نوعی کلاه

**cooling** *adjective, noun*

فێنک، سارد، هوونک ◇ خنک، سرد

**cooling-off period** *noun*

قۆناخی ئاشتبوونەوە، سەوربەندی دانوستان (کێشەی نێوان کرێکار و خاوەنکار) ◇ دورەی مصالحه

**cooling tower** *noun*

قوللە یان کەلووی فێنککەرەوە یان فێنککردنەوە ◇ برج خنککننده

**coolish** /'ku:lɪʃ/ *adjective*

کەمێ سارد ◇ نسبتاً سرد

**coolth** /ku:lθ/ *noun*

(بڕێ) سەرمایێکی خۆش ◇ سرمای مطلوب

**coon** /ku:n/ *noun*

1 (ئەمریکای باکووری) کورتەی = raccoon 2 قولەڕەشە (وشەیەکی ساردوسووکە بۆ ڕەشەکان بەکاردێنرێ) ◇ کاکاسیا

**cooncan** /'ku:nkan/ *noun*
جۆرێ کایە بەپەڕی دووکەسە، لە بنەڕەتا هی مەکسیک، شێوەی رامی rummy دەدا ◌ کونکَن

**coon cat** = maine coon

**coon cheese** *noun*
پەنیرێکی cheddarی تیژ (بنەڕەت: لە ناوی Edward W. *Coon*) ◌ نوعی پنیر

**coonhound** *noun*
کوونخنکێنە، راکوونگر، جۆرێ رەگەزی سەگ ◌ کونهوند

**coonskin** *noun*
1 کەوڵ یا پێستەی راکوون 2 شتومەک لە کەوڵی راکوون ◌ کوناسکین

**coontie** *noun*, also arrowroot
1 هەریەک لە دوو arrowrootی فلۆریدا 2 [*Zamia integrifolia or Z. floridana*] ئاردێ کە لە نشاستەی کوونتی دەگیرێ ◌ کونهوند

**coop** /ku:p/ *noun*
1 قەفەس، رکە، بێرکم 2 سەوەتەی راوەماسی ◌ 1 قفس 2 سبد ماهی‌گیری

**co-op** /'kəʊɒp/ = informal co-operation

**cooped up** *adjective*
زیندانی، بەندی ◌ محبوس

**cooper** /'ku:pə(r)/ *noun*
بەرمیل‌ساز، کوس‌گەر، کۆسەوان، بۆشکەدروسکەر ◌ بشکه‌ساز

**cooperage** /'ku:pərɪdʒ/ *noun*
1 کۆس‌گەری، بەرمیل‌دروس‌کردن، بۆشکەسازی 2 کۆسانە، بەرمیلانە، کرێی چاک‌کردنەوەی بەرمیلەکان ◌ 1 بشکه‌سازی 2 کوپراژ

**cooperation** /kəʊˌɒpə'reɪʃn, US koʊˌɑ:p-/ *noun*, also co-operation
1 هاوکاری، هاریکاری، گەلەکۆمە(کی)، ئالیکاری 2 هەرەوەز، زبارە 3 کۆمەک، یارمەتی، یاریدە ◌ 1 همکاری، تشریک مساعی 2 تعاون 3 مساعدت

**cooperative** /kəʊ'ɒpərətɪv, US koʊ'ɑ:p-/ *adjective, noun*
*adj* 1 زبارەیی، هەرەوەزی: *cooperative efforts* 2 پێکەوەیی، هاوبەش، بەکۆمەڵ، سەربە هاوکاری *n* ڕێکخراوە یان ئێوکۆیی هەرەوەز (*adv* cooperatively: پێکەوەیی‌یانە، پێکەوە، بە هاوکاری، بە ئالیکاری؛ cooperativeness *n*) ◌ *adj* 1 تعاونی 2 جمعی، وابسته به همکاری *n* سازمان یا شرکت تعاونی

**cooperative movement** *noun*
بزووتنەوەی هەرەوەز یان هاوکاری ◌ جنبش تعاونی

**cooperative society** *noun*
کۆمەڵەی هەرەوەز یا هاوکاری ◌ جمعیت تعاونی

**cooperator** *noun*
1 هاوکار، ئالیکار 2 ئەندامی ڕێکخراوەی هەرەوەز ◌ 1 همکار 2 عضو سازمان تعاونی

**Cooper's hawk** *noun*
باز یان واشەی کووپێر، جۆرێکی ئەمریکایی [*Accipiter cooperii*] (لە ناوی باڵندەناسی ئەمریکایی William *Cooper*، مەرگ 1864) ◌ نوعی باز

**coordinate** /kəʊ'ɔ:dɪnət, US koʊ'ɔ:rd-/ *adjective, noun*, also co-ordinate
1 (ڕێزمان) هاوپلە: *coordinate clauses* 2 (بیرکاری) کۆئۆردینێت 3 (کیمیا) کۆئۆردینێت 4 هاوتەراز، هاوسەنگ، هاوپلە، هاورێک، هاوپایە، هارێک، کۆئۆردینێت 5 (coordinates) دەست (coordinated *adj*: ڕێکخراو، سەقامەند، سەقام‌دراو) ◌ 1 هم‌پایه 2 مختصه، مختص، (در جمع) مختصات 3 (شیمی) کونوردینات 4 هم‌پایه، هم‌مرتبه 5 (در جمع) دست، ست

**coordinate bond** *noun*
(کیمیا) پەیوەستی هاوپلە یان هاوتەراز ◌ کوئوردینات بوند

**coordinate clause** /kəʊˌɔ:dɪnət 'klɔ:z, US koʊˌɔ:rd-/ *noun*
(ڕێزمان) لاڕستە یان دەستەوشەی هاوپلە ◌ بند هم‌پایه

**coordinate geometry** = analytic geometry

**coordinates** *noun, pl.*
بەرگی دەست یا پێکەوەلەبەرکراو، جل‌وبەرگی پێکەوتوو ◌ لباس جور

**coordinating conjunction** *noun*
پیتی پێوەندی هاوپلە، تیپی پێوەندی هاوپلە (بۆ نموونە *and*، *but*، *or* بڕوانە subordinating conjunction) ◌ حرف ربط هم‌پایه

**coordination** /kəʊˌɔ:dɪ'neɪʃn, US koʊˌɔ:rd-/ *noun*
1 پێکەوەکاری، پێکەوەکارکردن، پێکەوەکارپێکردن 2 (ڕێزمان) هاورێکی، هاوپلەیی 3 ڕێکخستن، هاوکاری، ئالیکاری، هەڤکاری 4 هاوپلەکردن، هاوپلاندن ◌ 1 هماهنگی، هماهنگ‌سازی، همکاری 2 (دستور زبان) هم‌پایگی 3 تطبیق، همکاری 4 هم‌رتبه‌سازی

**coordination centre** *noun*
ناوەندی ڕێکخستن ◌ مرکز هماهنگی

**coordination chemistry** *noun*
کیمیای کۆئۆردینەیشێن (هاورێکی) ◌ شیمی کوئوردیناسیون

**coordination compound** *noun*
ئاوێتەی کۆئۆردینەیشێن (هاورێکی) ◌ ترکیب کوئوردیناسیون

**coordination geometry** *noun*
ئەندازەی کۆئۆردینەیشێن (هاورێکی) ◌ هندسه‌ی کوئوردیناسیون

**coordination number** *noun*
ژمارەی کۆئۆردینەیشین (هاوڕێکی) ۞ عـدد کوئوردیناسیون

**coordinative** *adjective*
هاوپلێنەر، هاوڕێکخەر ۞ هم‌پایه‌کننده

**coordinator** *noun*
ڕێکخەر، پێکەوەبەکارخەر ۞ هماهنگ‌کننده

**coot** /ku:t/ *noun, pl.* same
1 مریشکەڕەشە [*Fulica atra*] و جۆرە پێوەندیدارەکان] 2 (نافەرمی) جوڕیاو، خەرەفاو، گەوج ۞ 1 چَنگر 2 احمق

**cooter** *noun*
کیسەڵ یان رەقەی ڕووباری ئەمریکای باکووری [*Pseudemys concinna*] و جۆرە پێوەندیدارەکان] ۞ کوتر

**cootie** /'ku:ti/ *noun*
(نافەرمی، لە ئەمریکای باکووریدا) ئەسپێی لەش، body louse ۞ شپش بدن

**co-owner** *noun*
هاوخاوەن، هاوخێو، خاوەنی هاوبەش، خاوەنی هاوبەش ۞ مالک مشترک

**co-ownership** *noun*
هاوخاوەنێتی، خاوەنداری یان خاوەنێتی هاوبەش ۞ مالکیت مشترک

**cop**[1] /kɒp, US kɑ:p/ *noun*
(نافەرمی) پۆلیس، ئاژان ۞ پاسبان

**cop**[2] /kɒp, US kɑ:p/ *noun*
ڕیسی سەرەتەشی، لووتک، نووک، نووچکە ۞ کوپ، نوک

**copacetic** /ˌkəʊpə'sɛtɪk, US -'si:t-/ *adjective*, also copasetic or copaesetic
(نافەرمی، ئەمریکای باکووری) عال، سەرنجڕاکێش، یەکجار باش، نمرەیەک، دەرەجە یەک ۞ عالی، درجه یک

**copaiba** *noun*
1 ڕۆنوجەوکێکی هاندەر stimulant oleoresin کە لە چەندین داری گەڵاپەڕی ئەمریکای باشووری دەگیرێ، لە خێزانی legume [توخم *Copaifera*] 2 درەختی کوپاییبا ۞ کوپایبا

**copal** /'kəʊp(ə)l/ *noun*
جۆری جەوی (هێندێ لە دارەکانی گەرمێنان)، بۆ varnish بەکاردێنرێ (بە ڕێگای سپانیایی لە "incense" Nahuatl *copalli*) ۞ کوپال

**coparcenary** *noun, pl.* coparcenaries
1 میراتگری یان بەشبەرێتی هاوبەش، joint heirship 2 خاوەنێتی یان خاوەنایەتی هاوبەش، joint ownership ۞ 1 وراثت مشترک 2 مالکیت مشترک

**coparcener** /kəʊ'pɑ:s(ə)nə/ *noun*
میراتگر یان بەشبەری هاوبەش؛ بەشدار، پشکدار، شەریک، هاوبەش ۞ وارث مشترک؛ شریک

**co-partner** /ˌkəʊ'pɑ:tnə(r)/ *noun*
بەشدار، پشکدار، شەریک، هاوبەش ۞ سهیم

**co-partnership** /ˌkəʊ'pɑ:tnərʃɪp/ *noun*
بەشداری، پشکداری، هاوبەشی، شەریکایەتی ۞ شراکت

**COPD** *abbreviation* (Medicine) chronic obstructive pulmonary disease

**cope** /kəʊp/ *noun*
جبەی قەشە یان سەرقەشە (لە بۆنەی ئایینیدا ceremonial) ۞ نوعی ردا

**copeck** = kopek

**copepod** /'kəʊpɪpɒd/ *noun, adjective*
گیانەوەری پێ‌سەوڵە، سەوڵەپا، کلکەپا ۞ کوپیپود

**Copepoda** /ˌkəʊpɪ'pəʊdə/ *noun, pl.*
(گیانەوەرناسی) پێ‌سەوڵان، سەوڵەپایان، کلکەپایان: پۆلێکی بەربڵاو لە crustacean وردە ئاوییەکان (زۆرتر ئاوی شیرین؛ بنەڕەت: لە یۆنانی *kōpē* "کلکە، دەسک، سەوڵ handle، oar" + *pod-*، *pous* "پا") ۞ کوپیپودا

**Copernican** /kə'pɜ:nɪkən/ *adjective, noun*
کۆپێرنیکی: سەربە ئەستێرەوانی پۆلەندی، نیکۆلاس کۆپێرنیک Nicolaus Copernicus (1473–1543) و تیۆری یان کۆمەڵەی کۆپێرنیکی؛ *n* Copernicanism ۞ وابسته به کپرنیک و تئوری یا منظومه‌ی کپرنیکی

**Copernican system** /kə'pɜ:nɪkən sɪstəm, US -'pɜ:rn-/ *noun*, also Copernican theory
(ئەستێرەوانی) کۆمەڵە یان ڕێکخستەی کۆپێرنیکی، دەزگای کۆپێرنیکی (تیۆری نیکۆلاس کۆپێرنیک Nicolaus Copernicus لەسەر بنچینەی ناوەندی‌بوونی خۆر لە کۆمەڵەی خۆریدا و زەوی و هەسارەکانی تر لە دەوریدا دەسووڕێنەوە) ۞ منظومه‌ی کپرنیکی

**copiable** *adjective*
لێی هەڵدەگیرێتەوە، لەکۆپی‌هاتوو، شیاوی هەڵگرتنەوە ۞ قابل کپی

**copier** /'kɒpiə(r), US 'kɑ:p-/ *noun*
دەزگای هەڵگرتنەوە یا کۆپی ۞ دستگاه فتوکپی

**co-pilot** *noun*
دوافڕۆکەوان، ئاوەڵفڕۆکەوان، یاریدەدەری فڕۆکەوان ۞ کمک خلبان

**coping** /'kəʊpɪŋ, US 'koʊpɪŋ/ *noun*
سەرڕیز، هێرە، سەردیوار، سەرەشێرە، بەردی سەرپۆش ۞ رخبام

**coping saw** *noun*
1 بەردی سەرڕیز، بەردی هێرە، بەردی سەرەشێرە 2 لووتکە، سەرچڵ، چلۆک، دوند ۞ نوعی اره

**coping-stone** *noun*
1 بەردی سەرڕیز، بەردی هێرە، بەردی سەرەشێرە 2 لووتکە، سەرچڵ، چلۆک، دوند ۞

1 سنگ کتیبه 2 اوج

**copious** /'kəʊpiəs, US 'koʊ-/ *adjective*

1 زۆر فرە، زۆروزەبەن، زەعف، یەکجار، زەبەن، بێهەژمار، لێشاو، فراوان، گەلێک: *a copious harvest* ◊ *copious references to other writers* 2 پڕکار، پڕنووس (نووسەر)، بەرهەمزۆر 3 بەربڵاو، فراوان، بەرفرەهـ (بنەڕەت: لە *copieux* فەرەنسی کۆن یان *copiosus* لاتین، لە *copia* "plenty"؛ copiously /'kəʊpiəsli, US 'koʊ-/ *adv*: بە زۆری: *copiously bleeding*؛ copiousness /'kəʊpiəsnəs, US 'koʊ-/ *n*: زۆری، پڕی، زەبەنی، فرەیی) ◇ 1 بسیار، معتنابه 2 پرکار 3 وسیع

**copita** /kə'pi:tə/ *noun*

شووشەی ملباریک، شێریخۆری ◇ کوپیتا

**coplanar** /kəʊ'pleɪnə/ *adjective*

هاوئاست، هاوتەخت، هاوڕوو (coplanarity *n*: هاوئاستی، هاوتەختی، هاوڕوویی) ◇ همصفحه

**copolymer** /kəʊ'pɒlɪmə/ *noun*

هاوفرەپارژە، هاوفرەبەش، کۆپۆلیمێر ◇ همبسپار، کوپلیمر

**copolymerization** *noun*

هاوفرەپارژەبوون، هاوفرەبەشبوون، کۆپۆلیمێربوون ◇ کوپلیمرشدن

**cop-out** *noun*

خۆدزینەوە، لەژێر کاردەرچوون ◇ عمل جا زدن

**copper**[1] /'kɒpə(r), US 'kɑ:p-/ *adjective, noun*

*adj* 1 مس، پاخر 2 پوولەوردە، قەرەپوول، پارەی ڕەشەوەبوو، پارەی مسین 3 مەنجەڵ، برۆش 4 (ڕەنگ) مسی، قاوەیی مەیلەو سوور *n* مسی، مسکرد (coppery /'kɒpəri, US 'kɑ:p-/ *adj*: مسین، مسی، مسئاسا) ◇ *adj* 1 مس 2 پول خرد 3 دیگ، پاتیل 4 مسی (رنگ) *n* مسی

**copper**[2] /'kɒpə(r), US 'kɑ:p-/ *noun*

پۆلیس، ئاژان ◇ پاسبان

**copper beech** *noun*

سوورەڕاش (دار) ◇ راش سرخ

**copper-bottomed** *adjective*

دڵنیا، جێیمتمانە، جێیباوەڕ، باوەڕپێکراو، پتەو، تۆکمە، نەکەوتوو ◇ مطمئن، محکم

**copperhead** /'kɒpəhed/ *noun*

سەرمسین (مارێکی ژاراوی [*Agkistrodon contortrix* (ئەمریکای باکووری) *Austrelaps superbus* (ئەوسترالیا)]) ◇ کوپرهد

**copperplate** /'kɒpəpleɪt, US 'kɑ:pər-/ *noun*

تەختەمس، تەتەڵەمس (چاپ) ◇ لوح مسی

**copper pyrites** = chalcopyrite

**coppersmith** /'kɒpəsmɪθ/ *noun*

مسگەر، مسگەر ◇ مسگر

**copperwork** /'kɒpəwɜ:ks/ *noun*

مسگەری، مسگەری، مسگەرخانە ◇ مسگرخانه

**coppice** /'kɒpɪs, US 'kɑ:p-/ = copse

**copr(o)-** *prefix*

پێشگر: پیسایی، گوو، پەیینک، پەیین: (بنەڕەت: لە *kopros* یۆنانییەوە "dung") ◇ پیشوند: مدفوع، کود *coprophagous*

**copra** /'kɒprə, US 'koʊprə/ *noun*

کاکڵە گوێزهیندیی یان نارگیلی وشککەوەبوو (بنەڕەت: لە *koppara* مالایالام Malayalam "گوێزهیند") ◇ مغز نارگیل خشک‌شده

**coprecipitation** *noun*

هاونیشتن، هاونیشتنی ◇ همرسوبی

**copro-** = copro

**coprocessor** *noun*

(کامپیوتێر) هاولێکدەرەوە ◇ همپردازشگر

**coproducer** *noun*

هاوبەرهەمهێنەر، بەرهەمهێنەری هاوبەش ◇ تولیدکنندەی مشترک

**coproduction** *noun*

هاوبەرهەمهێنان، بەرهەمهێنانی هاوبەش (coproduct *n*: لابەرهەم، بەرهەمی لاوەکی، دەمبەرهەم، لاحاسڵ) ◇ تولید یا فرآوری مشترک

**coprolite** /'kɒprə(ʊ)laɪt/ *noun*

(زەویناسی) بەردەپەیین، شیاکەبووبەرد، کۆپرۆلیت ◇ کوپرولیت

**coprology** /kɒ'prɒlədʒɪ/ *noun*

پەیینکناسی، کۆپرۆلۆژی (coprologist *n*) ◇ کودشناسی

**coprophagous** *adjective*

پیساییخۆر ◇ کوپروفاگوس مدفوع‌خوار

**coprophagy** /kɒ'prɒfədʒɪ/ *noun*, also -phagia /ˌkɒprə(ʊ)'feɪdʒɪə/

پیساییخۆری (coprophagic *adj*) ◇ کوپروفاگی، مدفوع‌خواری

**coprophilia** /ˌkɒprə(ʊ)'fɪlɪə/ *noun*

پیساییدۆستی (بە شێوەیەکی نائاسایی) ◇ کوپروفیلیا

**copse** /kɒps, US kɑ:ps/ *noun*

بێشە، بێشەلان، شەخەڵ، تەرت، چوغورد، دەوەنجاڕ ◇ بیشەزار

**cop shop** *noun*

وێستگەی پۆلیس ◇ ایستگاه کلانتری

**Copt** /kɒpt/ *noun*

1 کۆپت، کاپت: میسرییەکی ڕەسەنی سەردەمی ڕۆم و یۆنانییەکان 2 ئەندامی کلێسەی کۆپتیک، کلێسەی ڕەسەنی کریستانیەتی میسر ◇ کوپت

**copter** /'kɒptə(r), US 'kɑ:p-/ *noun*

هێلیکۆپتێر، بالافڕ، راسفڕ ◇ چرخبال

**Coptic** /'kɒptɪk/ *adjective, noun*

*adj* قیبتی، کاپتی *n* کاپتیک، زمانی کاپتی (که تەنیا لە کلیسەی کوپتیک دەپارێزرێ) ◊ *adj* قبطی *n* زبان قبطی

**the Coptic Church** *noun*
کلیسەی کاپتیک ◊ کلیسای قبطی

**copula** /'kɒpjʊlə, US 'kɑ:p-/ *noun*
(ڕێزمـان) کـاری بەسـتەر یـان پێـکبەسـت (copular *adj*) ◊ فعل ربطی

**copulation** /ˌkɒpju'leɪʃn, US ˌkɑ:p-/ *noun*
جووتبوون، نزیکی، سواربوون، گان، نیان ◊ جفت‌گیری، مقاربت

**copulative** /'kɒpjuletɪv, US 'kɑ:p-/ *adjective, noun*
*adj* بەستەر، گرێدەر، پێکبەست، لێکدەر، پێوەندیدەر *n* وشەی بەستەر یان پێکبەست (copulatively *adv*) ◊ *adj* رابط، ربطی *n* کلمەی رابط

**copy** /'kɒpi, US 'kɑ:pi/ *noun, pl.* copies
1 کۆپی، ڕوونووس، نوسخە، لێهەڵگیراوە، ڕایش، ڕووە، ڕووگیراوە، فۆتۆکۆپی: *I will send you a copy of the report* 2 (کتێب) دانە، بەرگ، نوسخە: *a copy of 'The Times'* 3 (ڕۆژنامە) دانە، ژمارە، دەنک، دانە 4 بابەت، مژار، نڤیسار (ڕۆژنامە و کۆڤار) 5 ئاگاداری ◊ 1 نسخە، رونوشت، کپی، فتوکپی 2 (کتاب) نسخە، جلد 3 (روزنامە) نسخە، دانە 4 مطلب 5 آگهی

**copybook** /'kɒpibʊk, US 'kɑ:p-/ *adjective, noun*
*adj* تەواو، ڕەبەق، بێگەرد، بێ‌کەم‌وکوڕی: *It was a -book operation by the police* *n* دەفتەری سەرمەشق ◊ *adj* کامل *n* دفتر سرمشق

**copycat** /'kɒpikæt, US 'kɑ:p-/ *noun, adjective*
لاسایی‌کەرەوە، چاولێکەر، لێهەڵگرەوە ◊ مقلد

**copy desk** *noun*
(ڕۆژنامـەوانی) مێـزی ئامـادە و ڕێکخسـتنی بابەتەکان ◊ میز تهیه و تنظیم مطالب

**copy editor** *noun*
پێداچوونکار، چاپدۆز، پیاچوونەوان ◊ ویراستار

**copyholder** /'kɒpihəʊldə(r)/ *noun*
دواراستکەرەوە، یاریدەدەری ڕاستکەرەوە، ئاوەڵڕاستکەرەوە ◊ کمک مصحح

**copyist** /'kɒpiɪst, US 'kɑ:p-/ *noun*
1 ڕوونـووسهەڵـگر، لەبـەرگرەوە 2 لاسا(یی)کەرەوە، imitator ◊ 1 مستنسخ، نسخه‌بردار 2 مقلد

**copyreader** *noun*
نموونەخوێن، ◊ نمونه‌خوان

**copyright** /'kɒpiraɪt, US 'kɑ:p-/ *noun*
1 مـافی بڵاوکردنـەوە، مـافی وەشـان، مـافی لێهەڵگرتنەوە، مافی چاپ و دانان 2 خاوەنی مافی بڵاوکردنەوە ◊ 1 حق طبع و نشر، حق انحصاری 2 دارای حق انحصاری

**copyslip** /'kɒpislɪp/ *noun*
سەرمەشق، نموونە ◊ سرمشق

**copywriter** /'kɒpiraɪtə(r), US 'kɑ:p-/ *noun*
ئاگاداری‌نووس، بڵاوکنووس ◊ نویسندەی آگهی‌های بازرگانی

**copywriting** *noun*
ئاگـاداری‌نووسـی، بـڵاوکنووسـی، نووسـینی ئاگاداری ڕیکلام ◊ نوشتن آگهی‌های بازرگانی

**coquetry** /'kɒkɪtri, US 'koʊk-/ *noun*
ناز (ونووز)، عیشوە، ئەدا، خۆبادان، ئانوئین، کرێشمە، نازکردن ◊ عشوەگری، عشوە، کرشمە

**coquette** /kɒ'ket, US koʊ'ket/ *noun*
1 (ژن) بەناز، بەکرێشمە، بەئەدا، بەعیشوە، بە ئانوئینەوە 2 hummingbird پۆپنەی ئەمریکای باشـووری و ناوەنـدی [*Lophornis* و تۆخمەکانی تر] ◊ 1 عشوەگر 2 کوکت

**coquettish** /kɒ'ketɪʃ, US koʊ'k-/ *adjective*
بەناز، بەنازونووز، بەئەدا، بەئانوئین، بەکرێشمە، بەنازانـە، سـەرنجڕاکێش، دڵـڕفێن، لـەبار، ناسـکونـازدار: *a coquettish smile* (coquettishly /kɒ'ketɪʃli, US koʊ'k-/ *adv*: بـەناز و کرێـشمەوە؛ coquettishness /kɒ'ketɪʃnəs, US koʊ'k-/ *n*: بـەنازی، بـەئـەدایـی، بـەئانوئـینی، بەکرێـشمەیی، سەرنجڕاکێشی، دڵـڕفێنی، ناسکونازداری) ◊ عشوەگر، عشوەگرانە، جذاب

**coquito** /kɒ'ki:təʊ/ *noun, pl.* coquitos
گوێزهێندیلە: جۆرێ دارخورمای قەدئەستووری شیلیایی، کە بـڕێکی زۆری شـیلەی شـیرین و ڕیشاڵ دەگرێ [*Jubaea chilensis*] (بنەڕەت: لە سپانیایی‌یەوە، چکۆلێنراوی *coco* "گوێزهێند" coconut) ◊ کوکیتو

**cor**[1] /kɔ:(r)/ *interjection*
تەح، پیاح، تیاح، بەهـ چ خۆشە، ئاهـ: *Cor! Look at that!* ◊ ای وای، بە، اه

**cor**[2] /kɔ:(r)/ *noun*, also kor
پەکەی (پێوانی) جێگا capacity یان پێوەرێکی measure عیـبری و فینیکـایی Phoenician کۆن ◊ کور

**cor**[3] 1 corner 2 coroner 3 corpus 4 corresponding

**Cor** *abbreviation* Corinthians

**Cora** /'kɔ:rə/ *noun*
1 ئەندامی گەلێکی سوورپێستی ڕۆژئاوای مەکسیک 2 زمانی Uto-Aztecanی ئەو گەلە ◊ کورا

**coracle** /'kɒrəkl, US 'kɔ:r-, 'kɑ:r-/ *noun*

گەمیەخرە، خرەگەمی، خرەبەلەم، کۆراکل (ب. ت. لە ویلز و ئیرلەند بەکاردێنرا، زۆرتر قیربۆش یان پێستەپۆش دەکرا ) ◌ کاراکل

**coracoid** /ˈkɒrəkɔɪd/ *adjective, noun,* also coracoid process

(توێکاری) دەنووکەقالاوی، قیتایی یان چوکلەی قولاپئاسای شان: دەرپەڕیوی‌یێکی کورتی تیغەی شانی شیردەران، بەشێکی دووسەری bicep پێوە نووساوە ◌ نوک‌کلاغی، منقارالغرابی

**coracoid bone** *noun*

(توێکاری) ئێسکی دەنووکەقالاوی ◌ استخوان منقارالغرابی

**coral** /ˈkɒrəl, US ˈkɔːrəl, ˈkɑːrəl/ *noun, adjective*

*n* شیلان، مەرجان *adj* 1 شیلانی 2 (ڕەنگ) سوور یان سووری کاڵ، پەمەیی ◌ *n* مرجان *adj* 1 مرجانی 2 صورتی

**coralberry** *noun,* also coralberries

دەوەنێکی هەمیشەسەوزی ئەمریکای باکووری لە تیرەی honeysuckle [*Symphoricarpos orbiculatus*] ◌ جزیرەی مرجانی

**coral fungus** *noun*

کارگی شیلانی [توخم *Clavulina*] ◌ نوعی قارچ

**coral island** *noun*

دوورگە یا دوورگەی شیلانی، گرئاڤی شیلانی ◌ جزیرەی مرجانی

**Corallian** /kɒˈrælɪən/ *adjective*

(زەویناسی) کۆرالیایی: سەربە ڕۆژگاریَ لە سەردەمی ژووراسیکی ژووروو Upper Jurassic period کە بڕیکی زۆری نیشتووی بەردەگەچی لێ‌پێکهاتووە (بنەڕەت: لە *corallium* لاتین "coral" + -an) ◌ کورالین

**coralline** /ˈkɒrəlʌɪn/ *adjective, noun*

*adj* شیلانی، لە شیلان‌پێکهاتوو، شیلان‌دارشتە *n* 1 ڕەنگی مەرجانی یا سووری کاڵ 2 جۆرێ گیای سووروباوی دەریایی [*Corallina officinalis* و جۆرەکانی تر] ◌ *adj* مرجانی *n* 1 رنگ مرجانی 2 کورالین

**corallita** /ˌkɒrəˈliːtə/ *noun,* also coralita

شیلانۆکە: ڕەزێکی هەڵچووی گوڵ‌پەمەیی، ڕەسەنی مەکسیک و کارائیب [*Antigonon leptopus*] (بنەڕەت: چکۆلێنراوی *coral* سپانیایی "شیلان") ◌ کورالیتا

**corallite** /ˈkɒrəlʌɪt/ *noun*

(کۆنناسی) پەیکەری گەچی calcareous قاپئاسای cup-like پۆلیپی تاک‌شیلانی؛ شیلانی بووبەرد ◌ کورالیت؛ مرجان سنگ‌وارەای

**coralloid** /ˈkɒrəlɔɪd/ *adjective,* also coralloidal

شیلان‌ئاسا، شێوەمەرجان، شێوەشیلان (زۆرتر لە بواری زیندەوەرناسی و گیانەوەرناسی‌دا) ◌ مرجان‌مانند

**coral reef** *noun*

شۆستەی شیلانی ◌ آب‌سنگ مرجانی

**coralroot** *noun*

1 جۆرێ گیاسارەی saprophytic ی بێ‌گەڵا، بە گوڵی نادیارەوە [توخم *Corallorhiza*: چەندین جۆرن] 2 وشەیێکی تر بۆ cockscomb 3 (هەروەها coralroot bittercress) جۆرێ ڕووەکی دارستانی گوڵ ئەرخەوانی، ماسێکی خونچەئاسا لە بنی قەد و لاسکەکەی‌دا هەیە [*Cardamine bulbifera*] ◌ کورال‌روت

**coral snake** *noun*

ماری شیلانی، شیلانەمار، جۆرێکی ڕێڕێ و ژاراوی و لە خێزانی cobra [*Micrurus* و توخمەکانی تر، گەلێ جۆرن] ◌ مار مرجانی

**coral spot** *noun*

پەڵە یا پنکەی شیلانی: جۆرێ نەخۆشی ئاسایی دار و دەوەن، دەبێتە هۆی دەرکەوتنی گرێ‌یێکی سووری تۆخ یان پەمەیی ◌ اسپوت کورال

**coral tree** *noun*

داری شیلانی [توخم *Erythrina*] ◌ درخت مرجانی

**cor anglais** /ˌkɔːr ˈɒŋgleɪ, US ɔːŋˈgleɪ/ *noun, pl.* cors anglais pronunc. same

کۆرئانگلێی (= جۆرێ ئامێری بایی یان فوویی، هەروەها English horn ب.ت. لە ئەمریکا) ◌ کرآنگله

**corbeil** /ˈkɔːbel, US -əl/ *noun*

(بیناسازی) سەوەتەی میوە یان گوڵ ◌ سبد میوە یا گل

**corbel** /ˈkɔːbl, US ˈkɔːrbl/ *noun,* also corbelling

1 دەرپەڕیوی، دەنووکە، پێش‌هاتە، زگدان، ورگدان 2 سەردەستەک، خەسارە، حەماڵ ◌ 1 پیش‌کردگی 2 زیر حمال

**corbicula** /kɔːˈbɪkjʊlə/, *pl.* corbiculae /-liː/ = pollen basket

**corbie** /ˈkɔːbi/ *noun, pl.* corbies

(سکاتلەند) قەلەڕەشە، قالاو ◌ کلاغ

**cor blimey** = cor

**cord** /kɔːd, US kɔːrd/ *noun,* also corduroy

1 تەناف، گوریس، دوز، وەریس، ڕیسمان، چەڵا، کەندر، شریت، پەت، پەتک، بەن، دەزوو، پێبەست 2 میل، ڕیڕێی پارچە 3 ئەندازەیەکی دارینە بە 128 پێ یان فووتی سێ‌جاوە (یان 3.62 میتری سێ‌جاوە) 4 بەستەر، پەتک، تاڵ، ژێ 5 تاڵ، ژێ (قوڕگ) 6 سیم، تاڵ، وایەر (تێل، کارەبا) ◌ 1 طناب، بند، نخ 2 راه پارچه 3 کورد 4 رباط، وتر 5 تار (حنجره) 6 سیم

**cordage** /kɔːdɪdʒ/ *noun*

گوریسان، کۆمەڵە گوریس، دەستەگوریس ◌

مجموعه‌ی طناب‌ها

**cordate** /ˈkɔːdeɪt/ *adjective*
(گیانه‌وه‌رناسی، رووه‌ک‌ناسی) شێوه‌دڵ، دڵی، دڵ‌ئاسا: *a cordate leaf* (cordately *adv*) ◌ قلبی‌شکل

**corded** /ˈkɔːdɪd, US ˈkɔːrd-/ *adjective*
1 ریری، میل‌میل، ribbed: *corded fabric* 2 گوریس‌دار، گوریس‌پێچ 3 بەستراو یان شەتەک‌دراو، جەرەبابەدراو (وەک گوریس یان پەتێ) 4 (لەمەڕ ماسوولکەیێکەوە) = tense، taut ◌ 1 راه‌راه 2 طناب‌دار 3 بسته، پیچیده

**Cordelier** /ˌkɔːdəˈlɪə/ = Franciscan Observant

**cordgrass** *noun*, also spartina
جۆرێ گیای ناوچە کەناری‌یەکانی ئەورووپا، باکووری ئەفریکا و جیهانی نوێ کە جاروبار بۆ جێگیرکردنی کەناری قوراوی mudflats بەکاردێترێ [توخم *Spartina*] ◌ نوعی گیاه

**cordial** /ˈkɔːdiəl, US ˈkɔːrdʒəl/ *adjective, noun*
*adj* خۆش، دۆستانە، گەرم، گەرم‌وگوڕ، تووند، قووڵ، لە دڵەوە: *a cordial relationship* ◊ *a cordial meeting* ◊ *cordial atmosphere n* 1 شەربەت، خۆشاو، شیراو 2 (لە ئەمریکا) = liqueur 3 دەرمانی تام‌شیرین ) cordially :/ˈkɔːdiəli, US ˈkɔːrdʒəli/ *adv* گەرم‌وگوڕانە، لە دڵەوە، بە گەرمی) ◌ *adj* صمیمانه، شدید، حاد *n* 1 شربت 2 و 3 کوردیال

**cordiality** /ˌkɔːdiˈæləti, US ˌkɔːrdʒi-/ *noun*
گەرم‌وگوڕی، گەرمی، خۆشی، خۆشەویستی، دۆستانی، دۆستایەتی: *I was greeted with a show of cordiality* ◌ صمیمیت، گرمی، محبت

**cordiform** *adjective*
دڵی، شێوەدڵ، لەدڵ‌چوو: *a cordiform sea-urchin shell* ◌ قلب‌مانند

**cordierite** /ˈkɔːdɪərʌɪt/ *noun*
کانێکی شینی تووند $(Mg,Fe)_2Al_4Si_5O_{18}$ کە لە ئالومینیۆم‌سیلیکاتی مەنیزیۆم و ئاسن پێکهاتووە، کانێکی ئاسایی بەردە گۆڕاوەکانە (بنەڕەت: لە ناوی زەوی‌ناسی فەرەنسی Pierre L. A. *Cordier* (1777–1861) ◌ کردیریت

**cordillera** /ˌkɔːdɪˈljɛːrə/ *noun*
ریزەکێو، زنجیرەچیا، گیسی، زنجیرەکێویکی هاوتەریب parallel، ب.ت. هی چیاکانی ئاند Andes و راکی Rocky (cordilleran *adj*) ◌ رشته کوه

**cordite** /ˈkɔːdaɪt, US ˈkɔːrd-/ *noun*
1 کوردیت (= تەقەمەنی‌یەکی بێ‌دووکەڵە کە لە نیترۆسیلولۆس nitrocellulose، نیترۆگلیسیرین nitroglycerine و ولولەی نەوت(ی خاو) petroleum jelly ساز دەبێ) 2 باڕووت ◌ 1 کوردیت 2 باروت

**cordless** *adjective*
(تەلەفون یان کەل‌وپەلی برقی) بێ‌سیم، بێ‌تەل ◌ بی‌سیم

**cordoba** /ˈkɔːdəbə/ *noun*
یەکەی بنەڕەتی پارەی نیکاراگوا، بەرامبەر بە سەد centavo ◌ کوردوبا

**cordon** /ˈkɔːdn, US ˈkɔːrdn/ *noun*
1 هێڵ یان ریزی پۆلیس، بازنەی پۆلیس، سەرباز و هتد، ئاڵقەی پۆلیس، ئاڵقە(بەندان)ی گەمارۆ 2 پشتێنە، باریکە، تیزماڵک (جوانی) 3 (میعماری) پشتێنە، کۆردۆن (هەروەها string course) ◌ 1 خط یا صف پلیس، کمربند حفاظی 2 یراق، نوار 3 کوردون

**cordon bleu** /ˌkɔːdɔ̃ ˈblɜː, US ˌkɔːrdū/ *adjective, noun*
(*pl.* cordons bleus (pronounced same)) *adj* (فەرەنسی، بۆ چێشت‌لێنان) یەکجار باش، زۆرچاک، زۆر شارەزا، زۆر کەیبانوو *n* (*pl.* cordon-bleus) (cordon-bleu) جۆرێ waxbillی ناو قەفەسی ئەفریکایی [توخم *Uraeginthus*] ◌ *adj* ممتاز *n* نوعی پرنده

**cordon sanitaire** /ˌkɔːdɔ̃ sanɪˈtɛː/ *noun*, *pl.* cordons sanitaires pronunc. same
هێڵی قەرەنتینە، هێڵی خاوێن ◌ خط قرنتینه

**cordovan** /ˈkɔːdəv(ə)n/ *noun, adjective*
*n* ئاڤار، کوردۆڤان: جۆرێ چەرمی نەرم، لە بنەڕەتا لە پێستەی بزن و ئێستاش لە کەولی ئەسپ *adj* 1 (Cordovan) سەربە یان پێوەندی بە Cordoba (جاران *Córdova*) وە هەیە، شارێ لە باشووری فەرەنسە 2 دروست‌کراو یان سازکراو لە کۆردۆڤان ◌ کوردوان

**cords** *noun*
شەڵوار (پانتۆڵ) کۆردیری، دروس‌کراو لە پارچەی کۆردیری ◌ شلوار کُردروی، ساخته‌شده از پارچه‌ی کردروی

**corduroy** /ˈkɔːdərɔɪ, US ˈkɔːrd-/ *noun*
کۆردیری، کودەری، مەخمەری (لەدەزوو) ریرێ ◌ کردروی

**corduroy road** *noun*
کۆلکەرێ (بەسەر زەلکاوا)، ریگای زۆنگاو ◌ جاده‌ی باتلاقی

**corduroys** = cords

**cordwain** *noun*
(کۆن) سەختیان، ئاڤار، چەرمی کۆردۆڤان cordovan ◌ نوعی چرم

**cordwainer** /ˈkɔːdweɪnə/ *noun*
1 (کۆن) پێلاودروو، کەوش‌دروو 2 کریکاری چەرم‌ساز (cordwainery *n*: پێلاودروویی، کەوش‌دروویی) ◌ 1 کفش‌دوز 2 کارگر چرم‌ساز

**cordwood** *noun*
بەستە داری بڕوا بە cord یان بە درێژاییی‌ێ (بۆ سووتان) ۞ کفش‌دوزی

**cordy** /ˈkɔːdɪ/ *adjective*
گوریسی، کەندری ۞ ریسمانی

**core** /kɔː(r)/ *noun, adjective*
*n* 1 نێوک، چنجک، دەنک، تۆو، مەغز، کرۆک، کاکڵ، نێرک 2 بەشی سەرەکی یان ناوەندی، دڵ، ناوەند، چەق، جەرگە، نێرک: *the earth's core* ◊ *the core of a nuclear reactor* ◊ *the core* 3 (کابڵ) تاڵ، سیم *adj* بنەڕەتی، سەرەکی، بنگەهی، گرنگ‌ترین: *the core of the argument* ◊ *core curriculum* ◊ *The use of new technology is core to our strategy* ۞ *n* 1 هسته، مغز، لب 2 قسمت بنیادی، مرکز 3 (کابل) رشته *adj* اساسی، اصلی

**CORE** *abbreviation*, (also Core) Congress of Racial Equality
(لە ئەمریکا) کۆر (کۆمەڵە) بەرامبەری رەگەزی ۞ انجمن برابری نژادی

**coreference** *noun*
(زمانەوانی) هاوسەرچاوەیی، هاوژێدەری ۞ هم‌مرجعی

**coreferential** /ˌkəʊrɛfəˈrɛnʃ(ə)l/ *adjective*
(زمانەوانی، دوو یەکە unit یا توخم element) هاوسەرچاوە، هاوژێدەر ۞ هم‌مرجع

**coreligionist** *noun*, also co-religionist
هاودین، یەک‌دین، هاوئایین، هەڤۆل ۞ هم‌کیش

**corella** /kəˈrɛlə/ *noun*
جۆرێ توتی پۆپنەی سپی ئەوسترالاسیایی [*Cacatua sanguinea* (هی چکۆلانە) و جۆرەکانی تر] (بنەڕەت: لە Wiradhuri ـەوە) ۞ نوعی طوطی

**coreopsis** /ˌkɒrɪˈɒpsɪs/ *noun*
(رووەک‌ناسی) رووەکی: جۆرێ گیای تیرەی daisy (زۆرتر گوڵ‌زەرد [توخم *Coreopsis*]؛ بنەڕەت: لە *koris* یۆنانی "bug" + *opsis* "روو") ۞ نوعی گیاه

**co-respondent** *noun*
داوێن‌پیس، داوێن‌تەڕ، بێ‌ناموس، بەشدار لە زینادا، تاوانبار بە زینا لەگەڵ ژنی پیاوێکی تر (جاران، ماف) ۞ زانی، زانیه

**corf** /kɔːf/ *noun*
1 سەوەتە یا قرتاڵەی راوەماسی 2 سەوەتە، قرتاڵە، بەرچنە 3 عەرەبانە یان سەوەتەیێکی گەورە بۆ رۆکردنی خەڵووز ۞ 1 سبد ماهی‌گیری 2 سبد 3 کورف

**corgi** /ˈkɔːgi, US ˈkɔːrgi/ *noun*, also Welsh corgi, *pl.* corgis
سەگەگرگنە: سەگێکی چکۆلانەی پێکولی لووت خاڵ‌خاڵاوی (بنەڕەت: لە وێلزییەوە: لە *cor* "گرگن" + *ci* "سەگ") ۞ کورگی

**coriaceous** /ˌkɒrɪˈeɪʃəs/ *adjective*
(تەکنیکی) چەرم‌ئاسا، چەرمی، وەکوو چەرم، چیر ۞ چرم‌مانند

**coriander** /ˌkɒrɪˈændə(r), US ˌkɔːr-/ *noun*
گژنیژ، تاوڵی، بەنارۆمی، تاوڵە [*Coriandrum sativum*]، (رازیانک - گژنیژەکیوی(لە) ۞ گشنیز

**Corinthian** /kəˈrɪnθiən/ *adjective, noun*
*adj* کاریتنی، کۆرینتی (شێوازیکی خانەرێژی یان میعماری، کارینس یان کارینت، شاریکی باشووری یۆنان) *n* 1 سەربە کارینت 2 خەڵکی کارینت (یۆنانی کۆن) ۞ *adj* کورنتی *n* 1 وابسته به کورنت 2 اهل کورنت

**Corinthians** *noun, pl.*
کۆرینتیەنز: هەریەک لەو دوو نامە نووسراوەی (وەک دوو کتێبی سەربە پەیمانی نوێ) سەینت Paul بۆ دیانی‌یەکانی کارینت ۞ کورنتیانس

**Coriolis effect** /ˌkɒrɪˈəʊlɪs/ *noun*
(فیزیک) کاریگەری کۆریۆلیس: لادانی دیاری شتە جووڵۆک یان گەڕۆکەکان لە ئەنجامی Coriolis force ـەوە (بنەڕەت: لە پاش ناوی ئەندازیاری فەرەنسی Gaspard *Coriolis*) ۞ اثر کوریولیس

**Coriolis force** *noun*
(فیزیک) هێزی کۆریۆلیس: هێزیکی دیار لە ئەنجامی خولانەوەی زەوی کە شتە جووڵۆک یان گەڕۆکەکان (وەک هاوێژە یان مووشەک یان تەوژمی هەوایی) لادەدا بۆ لای راست لە نیوەگۆی باکووری و بۆ لای چەپ لە hemisphere نیوەگۆی باشووری(دا) ۞ نیروی کوریولیس

**corium** /ˈkɔːrɪəm/ *noun*, also dermis
1 ژێرپێست، بن‌پێست، پێستەی بنەوە، پێستی ژێرەوە 2 زریی چەرمی، زریٚ‌چەرمینە ۞ 1 زیرپوست 2 زره چرمی

**cork** /kɔːk, US kɔːrk/ *noun, adjective*
*n* 1 تۆپەوانە، چێوپەمە، تەپەدۆر، هەودەڵ، سەرەشووشە، سەرەبوتڵ 2 (رووەک‌ناسی، هەروەها phellem) چێوپەمە، تەپەدۆر: شانەی تەپەدۆری یان چێوپەمەیی دار: شانە یان توێ‌یێکی پارێزەری خانە مردووەکان، کوت‌ومت لەژێر توێکڵی رووەکە دارینەکانەوە (یان نێوان توێکڵ و ئاڵوگۆڕە cadmium لە رووەکە دارینەکان‌دا) *adj* تەپەدۆری، تۆپەوانەیی ۞ *n* 1 چوب‌پنبه، سر بطری 2 بافت چوب‌پنبه‌ای درخت *adj* چوب‌پنبه‌ای

**corkage** /ˈkɔːkɪdʒ, US ˈkɔːrk-/ *noun*
تەپەدۆرانە، چێوپەمەیی، کرێی بوتڵ، کری تەپەدۆر ۞ حق بطری

**corkboard** *noun*

تەختەتەپەدۆر، تەختەچێوپەمە ◇ کورک‌بورد
**corkage cambium** = phellogen
**corked** /kɔːkt, US kɔːrkt/ *adjective*
1 خراپبوو یان بۆگەنبوو، گەنیو (لەبەر تۆپەوانەکەی، مەی) 2 مەستی مەست ◇ 1 خرابشده 2 کاملاً مست
**corker** /ˈkɔːkə(r), US ˈkɔːrk-/ *noun*
(نافە رمی) یەکجارباش، جوان (مرۆڤ یان شت)، پێکەنینی (corking *adj*) ◇ (آدم یا چیز) عالی، زیبا، مضحک
**cork oak** *noun*
پەرووپیس، بەلوپوەل، داری تۆپەوانە، دارتەپەدۆرە [*Quercus suber*] ◇ درخت چوب‌پنبه
**corkscrew** /ˈkɔːkskruː, US ˈkɔːrk-/ *noun*
سەرهەڵپچڕ، شووشەکەرەوە، کۆرک‌کێش ◇ دربازکن
**corkwood** *noun*
درەختێکی چکۆلە، بە داری سووکی کونکونەوە [*Leitneria floridana* (ئەمریکا) یان *Entelea arborescens* (نیوزیلەند)] ◇ کورک‌وود
**corky** /kɔːkɪ/ *adjective* (corkier, corkiest)
1 تەپەدۆرئاسا، چێوپەمەیی، شێوەتەپەدۆر 2 (مەی) گەنیو: *corky wine* 3 چرچ، وشک‌هەڵگەڕاو (corkiness *n*: تایبەتمەندی چێوپەمەیی هەیە) ◇ 1 چوب‌پنبه‌مانند 2 خراب‌شده 3 چروک
**corm** /kɔːm, US kɔːrm/ *noun*
(رووەکناسی) بنە، بن، سەلک، نێرک، نێرتک ◇ بن‌ساقه
**cormlet** *noun*
بنەی چکۆلە، سەلکۆچکە، نێرکەلە، نێرتکەلە ◇ بن‌ساقه‌ی کوچک
**cormorant** /ˈkɔːmərənt, US ˈkɔːrm-/ *noun, adjective*
(گیانەوەرناسی) *n* 1 قەلەمراو (ی گەورە [*Phalacrocorax carbo* و جۆرەکانی تر]) 2 مرۆی چڵێس *adj* چڵێس، چاوبرسی، تێرنەخۆر ◇ *n* 1 باکلان 2 آدم حریص *adj* حریص
**corn**[1] /kɔːn, US kɔːrn/ *noun*
1 (رووەکناسی) دەغڵودان، خەلە، دەغڵ 2 گەنمەشامی، سەرداری، گوڵەپێغەمبەرە، گەرمەشانی، گەنموک، گوڵەگەنم ◇ 1 غله 2 ذرت
**corn**[2] /kɔːn, US kɔːrn/ *noun*
(پزشکی) مێخەکە، بزمارە، بزمارۆک، کۆنگرۆشک ◇ میخچه
**cornball** *adjective*
1 (نافەرمی) هیچ، هیچەکە، کۆن، رزیو، بێتام 2 سۆزەکی، سۆزداری، بەسۆز، هەست‌بزوێن ◇ 1 مبتذل، پیش‌پاافتاده 2 سوزناک
**cornbread** /ˈkɔːnbred, US ˈkɔːrn-/ *noun*
نانەسەرداری، نانی گەنمەشامی، کولێرە گەنمەشامی ◇ نان ذرت
**corn bunting** *noun*
جۆری بانتینگ [*Miliaria calandra*] ◇ نوعی پرنده
**corn chandler** *noun*
گەنمەشامی‌فرۆش ◇ فروشنده‌ی ذرت
**corncob** /ˈkɔːnkɒb, US ˈkɔːrnkɑːb/ *noun*
ساقەت یان لاسکی گەنمەشانی، لازوویت، گلک ◇ چوب بلال
**corncockle** *noun*
گیایێکی گوڵپەمەیی مەدیتەرانەیی، لە بریتانیا بژاری کێڵگەی گەنمەشامی‌یە و ئێستا دەگمەنە [*Agrostemma githago*] ◇ نوعی گیاه
**corncracke** *noun*
مریشکاویلەی خەنەیی، شێلاقەی گەنمەشامی [*Crex crex*] ◇ یلوه حنایی
**corn crib** *noun*
عەماری هەواکێشی گەنمەشامی ◇ کورن کریب
**corn-drill** *noun*
تووچێن، تووەشێن ◇ بذرافشان
**cornea** /ˈkɔːnɪə, US ˈkɔːrnɪə/ *noun*
کۆرنیا، شاخینە، رەقێنەی چاو (بنەڕەت: لە *cornea tela* "شانەی شاخی(ن)" horny tissue لاتین، لە *cornu* لاتین "شاخ horn") ◇ قرنیه
**corneal** /ˈkɔːnɪəl, US ˈkɔːrn-/ *adjective*
کۆرنیایی، شاخینەیی، سەربە یان پێوەندی بە کۆرنیاوە هەیە ◇ وابسته به قرنیه
**corn earworm** *noun*
جۆرێ پەپوولەی شەوگەڕی noctuid کە کرمۆکە larva سەرزەردە گەورە هێلاوی‌یەکانی ب.ت. بۆ گەنمەشامی indian corn، باینجان، تووتن و قوزاخەی لۆکە cotton boll زۆر بەزیانن [*Helicoverpa zea syn. Heliothis zea*] ◇ نوعی کرم
**corned** *adjective*
خوێ‌پێوەکراو، لەخوێ‌گیراو (راگیراو لە خوێ یان خوێاو) ◇ نمک‌سود
**corned beef** /ˌkɔːnd ˈbiːf, US ˌkɔːrnd/ *noun*
گۆشتی خوێ‌پێوەکراو یا لە خوێدا راگیراو ◇ گوشت نمک‌سود
**cornel** /ˈkɔːn(ə)l/ *noun*
(رووەکناسی) مر، جۆرێ dogwood، ب.ت. چکۆلانە [*Cornus suecica* و جۆرەکانی تر] ◇ کورنل
**cornelian** /kɔːˈniːlɪən, US kɔːrˈn-/ *noun*, also carnelian
ئاقیقی سوور ◇ عقیق یمانی
**cornelian cherry** *noun*
1 دەوەن یان دارۆچکەیێکی گوڵدەر، لە تیرەی dogwood [*Cornus mas*] 2 بەری سووری

خری خۆراکی ئەو دەوەنە ۞ نوعی درختچە

**corneous** /'kɔːnɪəs/ *adjective*

(فەرمی) شاخئاسا، شاخی، وەکوو شاخ، شێوەشاخ (بنەڕەت: لە لاتین *corneus* (بنەڕەت: لە *cornu* "شاخ") + -ous) ۞ شاخمانند

**corneous layer** *noun*, also horny layer or stratum corneum

توێ یان چینی شاخی ۞ لایەی شاخی

**corner** /'kɔːnə(r), US 'kɔːrn-/ *noun, adjective*

*n* 1 گۆشە، سووچ، قوڕنە، قولینچک، قوژبن، چمک، کونجیک، ئانیشکە، ویرنج، سەرپێچ (وەک هی سەرکۆلان): *the four corners of a square* 2 (corners) دەرو و کەنار، چوارقوڕنە، چوارلای دنیا، گۆشە و کەنار 3 پاوانکاری، قۆرخکاری 4 گۆشە، سووچ، کۆرنێر (تۆپێن) 5 گیروگرفت، تەنگوچەڵەمە، تەنگانە 6 (شەڕەمشت و زۆرانبازی) هەریەک لە دوو گۆشەی بەرامبەر کە لە نێوان گەڕەکاندا رکەبەرەکان دەحەسێنەوە *adj* گۆشەیی ۞ *n* 1 گوشە، نبش، زاویە 2 (در جمع) اطراف و اکناف 3 انحصار 4 کرنر (فوتبال) 5 مخمصە، مضیقە 6 کرنر *adj* گوشەای

**corner collenchyma** *noun*, also angular collenchyma

کۆلێنشیمی گۆشەیی ۞ کولانشین زاویەای

**cornered** *adjective*

1 گۆشەگۆشە، گۆشاوی، سووچن 2 (لە لێکدانا) ـگۆش، ـسووچ، ـپالوو، ـلایەنە، ـلایی، ـقۆلی ۞ 1 مزوی، گوشەدار 2 ـگوش، ـجانبە، ـسویە

**corner kick** *noun*

گۆشەلێدان، لێدانی گۆشە (تۆپێن) ۞ ضربەی کرنر

**cornerman** *noun, pl.* cornermen

گۆشەپیاو (یارمەتی بۆکسێر یان زۆرانباز دەدا) ۞ کورنرمن

**corner shop** *noun*

بەقالی ۞ بقالی

**cornerstone** /'kɔːnəstəʊn, US 'kɔːrnərstoʊn/ *noun*

1 گۆشەبەرد، بەردی گۆشە، تەمەڵە، هەرسیل، فەرهێت، سفنک، بنکەبەرد (یەکەمین بەردی بناخەی خانوو) 2 بناخە، بنەڕەت، بنچینە، پایە، کوک، قانگە، هیم، خیم، بەردی بناخە، گرنگترین بەش (کە ئەوانی دی پێوە بەندە) ۞ 1 سنگ زاویە، سنگ سوک 2 شالودە، پایە، بنیاد، مهمترین قسمت

**cornerwise** *adverb*, also cornerways

لارەولار، لابەلا، چەپوڕاست، لە سووچەوە، diagonally ۞ بەطور مورب

**cornet**[1] /'kɔːnɪt, US 'kɔːrnɪt/ *noun*

1 کۆرنێت (= ئامێرێکی موسیقایی برنجی و فوویی‌یە لە ترومپێت دەچێ) 2 بەستەنی یان دۆڵدرمەی قووچکەیی 3 نانەدۆڵدرمە، نانەبەستەنی، نانەقووچکەیی ۞ 1 کورنت 2 بستنی قیفی 3 نان بستنی

**cornet**[2] /'kɔːnɪt, US 'kɔːrnɪt/ *noun*

(جاران) ئاڵاهەڵگر: پلەی پێنجەمی ئەفسەریتی کادر لە (نێو) سەربازانی سوارەدا (کە ئاڵای هەڵدەگرت)؛ (لە هێندێ ڕێژیمێنتی بریتانیایی‌دا) ئەفسەرێکی بە پایەی second lieutenant ۞ علمدار

**cornetcy** /'kɔːnɪtsɪ/ *noun, pl.* cornetcies

ئاڵاهەڵگری ۞ علمداری

**cornetfactor** *noun*

دەغڵفرۆش، خەلەفرۆش ۞ غلەفروش

**cornetfish** *noun, pl.* same or cornetfishes

ماسی‌یەشاخە: جۆرێ ماسی دەریایی گەرمێنان، بە لمۆزێکی باریک و درێژەوە [تۆخم *Fistularia*: چەندین جۆرن] ۞ نوعی ماهی

**cornetist** /kɔː'netɪst/ *noun*, also cornettist

کۆرنێتژەن ۞ کورنت‌نواز

**cornetto** /kɔː'netəʊ/ *noun*, also cornett /'kɔːnɪt, US kɔː'net/ *pl.* cornetti or cornetts

شاخۆچکە، کۆرنێتۆ (ئامێرێکی موسیقا؛ بنەڕەت: لە ئیتالیایی‌یەوە، چکۆلێتراوی *corno* "شاخ"، لە *cornu* لاتینەوە) ۞ کورنتو

**corn exchange** *noun*

بازاڕی گەنمەشامی ۞ محل خرید و فروش ذرت

**cornfed** *adjective*

1 دانخۆر (ب.ت. هی گەنمەشامی): *cornfed hogs* 2 (ئەمریکا و نافەرمی) سادە، ساویلکە، unsophisticated ۞ 1 کورنفد 2 سادەلوح

**cornfield** /'kɔːnfiːld, US 'kɔːrn-/ *noun*

کێڵگەی سەرداری، کێڵگەی گەنمەشامی ۞ کشتزار ذرت

**cornflakes** /'kɔːnfleɪks, US 'kɔːrn-/ *noun, pl.*

کۆرنفلەیکس، برێشکەناسکە، کۆرنفلێیکس ۞ برشتوک

**cornflour** /'kɔːnflaʊə(r), US 'kɔːrn-/ *noun*

1 ئارد، ئاردی گەنمەشامی 2 ئاردی برنج، ئاردەبرنج ۞ 1 آرد ذرت 2 آرد برنج

**cornflower** /'kɔːnflaʊə(r), US 'kɔːrn-/ *noun*

(ڕووەکناسی) کانێژە، گوڵگوچیلە، گۆڵەگەنم [*Centaurea cyaneus* و جۆرە پێوەندی‌دارەکان] ۞ گل گندم

**cornhusk** *noun*

توێکڵ یان بەرگی گەنمەشامی ۞ غلاف یا پوست ذرت

**cornice** /'kɔːnɪs, US 'kɔːrnɪs/ *noun*

(بیناسازی) 1 هێرە، سەرلێو(ار)، سەلەندە 2

ئەخش و گەچبڕی بنمیچ (**corniced** *adj*؛ **cornicing** *n*) ۞ 1 قرنیز 2 ابزار و گچبری زیرسقف

**corniche** /ˈkɔːnɪʃ, US kɔːˈniːʃ/ *noun*
ڕێگاهێره، ڕیگایێ کە لەسەر لێواری هەڵدێری دروست کرابێ ۞ کورنیش

**cornicle** /ˈkɔːnɪkl/ *noun*
(گیانەوەرناسی) شاخۆچکە ۞ شاخک

**Cornish** /ˈkɔːnɪʃ, US ˈkɔːrnɪʃ/ *adjective, noun*
*adj* سەربە کۆرنوال (Cornwall) *n* زمانی کۆرنوالی، زمانێکی کۆنی سیلتیکی کۆرنوال Cornwall، سەربە لقی بریتۆنیک Brythonic ی دەستەزمانی سیلتیک (ئێستا وەک زمانی یەکەم قسەی پێناکرێ) ۞ *adj* وابسته به کورنوالی *n* زبان کورنوالی

**Cornishman** *noun, pl.* Cornishmen
کۆرنوالی، خەڵکی کۆرنوالی ئینگلتەرە ۞ کورنوالی

**Cornish pasty** /ˌkɔːnɪʃ ˈpæsti, US ˌkɔːrnɪʃ/ *noun*
پای چکۆلە کە هەویر و سەوزە و گۆشتی تیایە ۞ کرنیش پاستی

**Cornish rex** *noun*
جۆرێ پشیلەی تووکفری کورت، سەرچکۆلەی گوێزل ۞ نوعی گربه

**the Corn laws** *noun, pl.*
قانوونی گەنمەشامی (لە بریتانیا 1848ـ1849) ۞ قوانین ذرت

**corn liquor** = corn whisky

**corn marigold** *noun*
(ڕووەکناسی) هەمیشەبەهار، جۆرێ ڕووەکی daisyـئاسای گوڵزەرد [*Chrysanthemum segetum*] ۞ کورن ماریگولد

**cornmeal** /ˈkɔːn miːl/ *noun*
1 ئاردی گەنم 2 (لە ئەمریکا) ئاردی گەنمەشامی، (لە سکاتلەند) ئاردی پەڕشە ۞ کورنمیل

**corn on the cob** *noun*
گەنمەشامی، بەلال ۞ بلال

**cornpone** = down-home

**corn pone** *noun*
نانی سەرداری، نانەگەنمەشامی، کولیرە گەنمەشامی ۞ نان ذرت

**corn poppy** *noun*
نانودۆبڕ؟، کاسەشکێن؟: جۆرێ خەشخاش یان کۆکەنار یەکساڵەی گوڵسووری ئوروپایی [*Papaver rhoeas*] ۞ خشخاش زراعی

**cornrows** /ˈkɔːnrəʊz, US ˈkɔːrnroʊz/ *noun, pl.*
میلوپەلکە، کورنڕوز (جۆرێ شێوازی داهێنانی قژ) ۞ کورنروز

**corn salad** = lamb's lettuce

**corn snake** *noun*
ماری (نێو)گەنمەشامی، جۆرێکی درێژی ئەمریکای باکووری، نیشانەیێکی لە نێو دوو چاوی‌دا هەیە [*Elaphe guttata*] ۞ مار ذرت

**corn snow** *noun*
بەفری تەرزەیی ۞ برف تگرگی

**cornstalk** *noun*
لاسک یا ساقەتەی گەنمەشامی (ب.ت. Indian corn) ۞ ساقەی ذرت

**cornstarch** /ˈkɔːnstɑːtʃ, US ˈkɔːrnstɑːrtʃ/ = cornflour

**corn syrup** *noun*, also dextrose
شیرئاوی گەنمەشامی ۞ شربت ذرت

**cornu** /ˈkɔːnjuː/ *noun, pl.* cornua /ˈ-njʊə/
شاخ، سازبوون یان دروسبوونی شاخ، شاخپێکهاتن ۞ شاخ، پیدایش شاخ

**cornual** *adjective*
شاخی، سەربە یان پێوەندی بە شاخەوە هەیە ۞ وابسته به شاخ

**cornucopia** /ˌkɔːnjuˈkəʊpiə, US ˌkɔːrnjuˈkoʊpiə/ *noun*
1 (هەروەها horn of plenty) شاخی هێمای فراوانی ڕێژەن و بەپیتی 2 سەرچاوە، چاوکانی (*adj* cornucopian؛ بنەڕەت: لە late Latin، لە *cornu copiae* "شاخی زەبەنی یان فراوانی horn of plenty" (شاخێکی ئەفسانەیی کە هەرچیێک بویستایە بۆی دابین دەکردی) ۞ 1 کورنیوکوپیا 2 منبع

**cornuted** *adjective*
شاخدار، بەشاخ، خاوەنشاخ ۞ دارای شاخ

**corny** /ˈkɔːni, US ˈkɔːrni/ *adjective* (cornier, corniest)
1 بێتام، هەزارپارە، ناسەرنجڕاکێش 2 بەدان، پڕدان، بەبڕشت، بەبر، پڕدەغڵ 3 مێخەکەدەکردوو، مێخەکاوی ۞ 1 بی‌مزه 2 پرغله 3 دارای میخچه

**corn whiskey** *noun*
ویسکی گەنمەشامی ۞ ویسکی ذرت

**corolla** /kəˈrɒlə, US -ˈrɑːlə, -ˈroʊlə/ *noun*
(ڕووەکناسی) کڵاوەی گوڵ، تۆپ(ەگوڵ)، تانجیک، تاجی گوڵ، قاپی پەڕەی گوڵ، کۆپەڕەی گوڵ، ئاڵقەی پەڕەی گوڵ ۞ جام گل

**corollary** /kəˈrɒləri, US ˈkɔːrəleri, ˈkɑːr-/ *noun, pl.* corollaries
1 ئەنجام، پێشاژۆ، ئەکام 2 ئەنجامی لۆژیکی، ئەنجامی سروشتی یان ڕاستەوخۆ 3 لادۆز، دۆزی لاوەکی ۞ 1 نتیجه، پیامد 2 نتیجەی منطقی، نتیجەی طبیعی یا مستقیم 3 قضیەی تبعی

**corollate** *adjective*
کڵاوەدار، تانجیکدار، تۆپدار ۞ دارای جام گل

**coromandel** /ˌkɒrəˈmand(ə)l/ *noun*
1 (هەروەها coromandel ebony یان

(coromandel wood دارئابنووسی قاوەیی مەیلەوبۆر، بۆ کەلوپەلی ناومال بەکاردێنرێ 2 درەختی سری‌لانکای بەرهێنەری ئەم دارە [*Diospyros quaesita*] ۞ کوروماندل

**corona**[1] /kə'rəʊnə, US -'roʊ-/ *noun, pl.* coronae /-niː/

خەرمانە، ئاخلە، تاج، تەوقە، سەر، نووک، تامار (ب.ت. مانگ‌گیران و خۆرگیران) ۞ تاج خورشید، نوک، هاله یا اکلیل ماه

**corona**[2] /kə'rəʊnə, US -'roʊ-/ *noun*

سیگاری بەلگی درێژی لاڕاست ۞ کرونا

**Corona Australis** *noun,* New Latin. literally, southern crown

تاجی باشووری: کۆئەستێرەی constellation باشووری نزیک بە Sagitarius لە باشووردا ۞ اکلیل جنوبی

**Corona Borealis** *noun.* New Latin, literally, northern crown

تاجی باکووری: کۆئەستێرەی باکووری نێوان Herules و Boötes ۞ صورت فلکی اکلیل شمالی

**coronach** /'kɒrənək, US -x/ *noun*

(لە سکاتلەند و ئیرلەند) لاواندنەوە، شیوەن (بە مەشکەنایە bagpipes لێدەدرێ) ۞ شیون

**coronagraph** *noun,* also coronograph

خەرمانەڕوان، تاجڕوان، کۆرۆناگراف، کۆرۆنۆگراف: دووربینێ بۆ ڕوانینی خەرمانە یان تاجی خۆر ۞ کوروناگراف

**coronal**[1] /kə'rəʊn(ə)l, US 'kɒr(ə)n(ə)l/ *adjective, noun*

*adj* 1 تاجی، تەوقەیی، خەرمانەیی 2 (دەنگناسی) سەربە تیغەی زمانی *n* نەبزوێنی تیغەی زمانی ۞ *adj* 1 وابستە بە تاج، فرقی 2 کورونال *n* همخوان کورونال

**coronal**[2] /kə'rəʊn(ə)l, US 'kɒr(ə)n(ə)l/, *noun*

1 تاجەسەر، تاجەگوڵینەی سەر 2 (کۆن) = coronet ۞ حلقەی گل سر

**coronal bone** = former term for frontal bone

**coronal suture** *noun*

(توێکاری) درز یان قەڵەشی تاجی: درزی نێوان ئێسکەکانی ژوورمەلاشوو و ناوچاوان ۞ درز اکلیلی

**coronary** /'kɒrənri, 'kɔːrəneri/ *adjective, noun* (*pl.* coronaries)

*adj* 1 تاجی، خەرمانەیی، تاج‌ئاسا، ئاخلەیی، تاماری 2 سەربە خوێنبەرە تاجی یان خەرمانەیی‌یەکان، دڵی *n* (نافەرمی) سەکتە، ڕاوێستانی دڵ، دڵەکپێ، هێرشی دڵ (ب.ت. coronary thrombosis) ۞ *adj* 1 تاجی، اکلیلی 2 وابستە بە شریان‌های اکلیلی، قلبی *n* سکتە

**coronary artery** *noun*

خوێن‌بەرە تاجی یان خەرمانی‌یەکان ۞ سرخرگ‌های قلبی

**coronary-care unit** *noun, abbreviation* CCU

بەشی چاودێری دڵی ۞ سی‌سی‌یو، بخش مراقبت(های) قلبی

**coronary occlusion** *noun*

گیران یان بەسترانی تاجی یان خەرمانەیی: گیرانی بەشێ یان تێکڕای خوێن‌بەرە تاجی‌یەکان ۞ اوکلوسیون قلبی

**coronary heart disease** *noun,* also coronary artery disease

نەخۆشی تاجی یان خەرمانەیی دڵ، نەخۆشی خوێن‌بەری تاجی: کۆمەڵێ کێشە و ناسازی سەبارەت بە دڵ کە هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کەم‌ڕژانی خوێن بە ڕێگای خوێن‌بەرە تاجی‌یەکانەوە ۞ سکتەی قلبی

**coronary sinus** *noun*

کاناڵێکی خوێن‌هێنی گەورە لە دیواری دڵدا کە خوێن بە ڕێگای خوێن‌هێنە تاجی‌یەکانەوە وەردەگرێ و لەنێو گوێچکەلەی ڕاستدا right atrium بەتاڵی دەکاتەوە ۞ سینوس کروناری

**coronary thrombosis** *noun*

گیرانی خوێنبەرەکانی دڵ، دڵەکپێ، ڕاوێستانی دڵ ۞ سکتەی قلبی

**coronary vein** *noun*

خوێن‌هێنی تاجی یا خەرمانەیی ۞ سیاهرگ قلبی

**coronation** /ˌkɒrə'neɪʃn, US ˌkɔːr-/ *noun*

1 ئاهەنگی تاج‌لەسەرنان 2 لەسەرتەخت‌دانان (شا یا شاژن) ۞ 1 مراسم تاج‌گذاری 2 تاج‌گذاری

**coronavirus** *noun, pl.* coronaviruses

ڤایرۆسی تاجی: هەریەک لە ڤایرۆسە خڕ و تاک‌ڕیشاڵە RNA ـداره جۆراوجۆرەکانی خێزانی Coronaviridae، چەندین جۆر دەگرێتەوە کە دەبنە هۆی نەخۆشی‌یە ئاستەمەکانی هەناسەدان ۞ کوروناویروس

**coroner** /'kɒrənə(r), US 'kɔːr-/ *noun*

لەش‌دۆز، توێکاری لەشی مردوو، لێکۆڵەری مەرگە کت‌وپڕ یان گوماناوی‌یەکان ۞ مأمور تحقیق در مرگ‌های مظنون

**coronership** *noun*

لەش‌دۆزی، توێکاری یان یەکالاکردنەوەی لەشی مردوو، لێکۆڵینەوەی مەرگە کت‌وپڕ یان گوماناوی‌یەکان ۞ تحقیق در مرگ‌های مظنون

**coronet** /'kɒrənet, US ˌkɔːrə'net, ˌkɑːr-/ *noun*

1 نیوەتاج، تاجۆکە، تاجی بچووک 2 تاجەگوڵ، ئاڵقەی سەر (ب.ت. لە گوڵ) 3 بازنە یان ئاڵقەیێکی ئێسکی لە بنی شاخی گاکێوی 4 بەستی بەشێ لە سمی ئەسپ کە خانەکانی

شاخی بەرهەم دێنێ، خوارترین بەشی سمەلۆچکەی ئەسپ یان گیانەوەر و ئاژەڵێکی سمداری تر، دروست لە ژوور سمەوە ◇ 1 نیم‌تاج 2 سرآذین 3 و 4 کورونت

**coroniform** *adjective*
تاج‌ئاسا، تاجی، وەک تاج، شێوەتاج ◇ تاج‌مانند

**coronoid** *adjective*
وەک دەنووکی قەلەڕەشە، دەنووک‌قالاو ◇ منقاری

**coronoid process** *noun*
(توێکاری) چوکڵەی دەنووکی یان قولاپی، دەرەپەڕیوی‌یێ لە بەشی پێشەوەی ulnaدا ◇ کورونوید پروسس

**Corp** *abbreviation* 1 corporation 2 corporal

**corpora** = plural form of corpus

**corporal**[1] /'kɔ:pərəl, US 'kɔ:rp-/ *adjective*
1 لەشی، پەیکەری، گیانی، جەستەیی، تەنانی، تەنی: *corporal punishment* 2 کەسی، خۆیی (بنەڕەت: بە ڕێگای فەرەنسی کۆن لە *corporalis* لاتین، لە *corpus*، *corpor-* "لەش") ◇ 1 کالبدی، جسمانی، بدنی 2 شخصی

**corporal**[2] /'kɔ:pərəl, US 'kɔ:rp-/ *noun*, also Corp
1 ئەندامی پایەنزمی سپا یان هێزی دەریایی و هێزی ئاسمانی بریتانیا 2 (هەروەها ship's corporal، بریتانیا، مێژوویی) ئەفسەری پایەنزم 3 وشەیێکی ئەمریکای باکووری بۆ fallfish ◇ 1 سرجوخه 2 و 3 کورپورال

**corporal**[3] *noun*
پەڕۆ یان پارچەی ژێر جامی مەی یان دەوری نان بە درێژایی ڕێوڕەسمی شێوی خواوەندی ◇ کورپورال

**corporality** *noun*, *pl.* corporalities
جەستەیی‌بوون، جەستایەتی، تەنانێتی، لەشێتی ◇ جسمانیت

**corporally** /'kɔ:pərəli, US 'kɔ:rp-/ *adverb*
بە لەش، بە جەستە ◇ جسماً

**corporal punishment** *noun*
لێدان، بیراز، تەمێ‌کردنی لەشی، سزای لەشی یان جەستەیی، کوتەک‌کاری ◇ تنبیه بدنی

**corporal world** *noun*
جیهانی لەشی یان جەستەیی ◇ جهان جسمانی

**corporate** /'kɔ:pərət, US 'kɔ:rp-/ *adjective, noun*
*adj* 1 سەربە کۆمپانی 2 یەک‌پارچە، یەک‌گرتوو، یەک‌کراو، یەکێتراو، یەک‌کەوتوو، هاوبەش، پێکەوە، بەکۆمەڵ: *a plan to reorganize the corporate structure* *n* کۆمەڵ یان کۆمپانی یەک‌گرتوو ◇ *adj* 1 وابسته به شرکت 2 متحد، واحد، مشترک، جمعی *n* گروه یا شرکت متحد

**corporately** *adverb*
پێکەوە، بەکۆمەڵانە، بە جەماوەری ◇ بە طور جمعی

**corporation** /ˌkɔ:pə'reɪʃn, US ˌkɔ:rp-/ *noun, adjective*
*n* 1 نیوکۆیی، کۆمپانی، دامەزرە، بنگا، نەقابە: *multinational corporations* 2 سازی، ڕێکخراوە 3 ئەنجومەنی (نافەرمی) شار 4 (نافەرمی) زگزل، زگ‌مەشکە، ورگن، کوویە *adj* شاری ◇ *n* 1 شرکت، بنگاه، مؤسسه 2 سازمان 3 شورای شهر 4 شکم گنده *adj* شهری

**corporation tax** *noun*
باجی نیوکۆیی‌یەکان یان کۆمپانیاکان ◇ مالیات شرکت‌ها

**corporatism** /'kɔ:pərətɪzəm, US 'kɔ:rp-/ *noun*
کۆمەڵەخوازی، کۆمەڵەگەری (سیاسەت) ◇ گروه‌گرایی

**corporatist** /'kɔ:pərətɪst, US 'kɔ:rp-/ *noun, adjective*
*n* کۆمەڵەخواز، کۆمەڵەگەر *adj* کۆمەڵەگەرانە، کۆمەڵەخوازانە ◇ *n* گروه‌گرا *adj* گروه‌گرایانه

**corporative** /'kɔ:pə'reɪtɪv, US 'kɔ:rp-/ *adjective*
سەربە نیوکۆیی، سەربە یان پێوەندی بە کۆمپانیاوە هەیە ◇ وابسته به شرکت

**corporator** /'kɔ:pəreɪtə(r), US 'kɔ:rp-/ *noun*
1 ئەندامی نیوکۆیی، ئەندامی کۆمپانی 2 ئەندامی هەڵبژێراوی بەڕێوەبردنی شاری ◇ 1 عضو شرکت 2 کورپوراتور

**corporeal** /kɔ:'pɔ:riəl, US kɔ:r'p-/ *adjective*
لەشی، جەستەیی، لاشەیی، تەنانی، مادی، نامانایی، ناسپیریتچوال، مەتریال: *his corporeal presence* (corporealness *n*) ◇ جسمانی، مادی

**corporeality** /-'ælɪti/ *noun*
لەشایەتی، جەستایەتی، تەنێتی، مادایەتی ◇ جسمانیت، مادیت

**corporeally** /kɔ:'pɔ:riəli, US kɔ:r'p-/ *adverb*
بە شێوەیەکی مادی یان جەستەیی ◇ بە طور مادی یا جسمی

**corporeity** /ˌkɔ:pə'ri:ɪti, US -'reɪti/ *noun*, *pl.* corporeities
(دەگمەن) سروشت یان تایبەتمەندی مادی، مادێتی، مادایەتی ◇ طبیعت یا خاصیت مادی

**corposant** /'kɔ:pəzənt/ *noun*, also Saintt Elmo's fire
(کۆن) دەرکەوتنی St Elmo's fire لەسەر کەشتی ◇ کورپوسانت

**corps** /kɔ:(r)/ *noun*, *pl.* corps /kɔ:z/

1 سپا، لەشکر، ق(و)شون: *the commander of the* :یەکە، یەکینە 2 *the third army corps* گروپ، دەستە، 3 *Army Corps of Engineers* کۆمەڵە، تیپ: *a corps of trained and experienced doctors* 4 تابوور، هەنگ ◌ 1 سپاه، قشون 2 یکان 3 هیأت، گروه 4 فوج

**corps de ballet** /ˌkɔː də ˈbæleɪ, US ˌkɔːr də bæˈleɪ/ *noun*
(فەرەنسی) تیپی بالێی یان بالە ◌ گروه باله

**corps de logis** *noun*
(فەرەنسی) بەشی بنەڕەتی خانوو یان دەزگایێ ◌ بخش اصلی بنا

**corpse** /kɔːps, US kɔːrps/ *noun*
1 کەلاک، لاشە، لاک، کەلەخ، جەندەک، تەرم، مردە، مردارە 2 پاشماوە، شوێنەوار (بنەڕەت: لە *corps* ،*cors* ئینگلیسی فەرەنسی، لە *corpus* لاتین) ◌ 1 جسد، مردار، نعش، مرده 2 آثار

**corpsman** /kɔːps, US kɔːrps/ *noun, pl.* corpsmen
برین پێچی کەشتی، دواپزشک یا ئاوەڵ پزشکی کەشتی ◌ پزشکیار کشتی

**corpulence** /ˈkɔːpjʊːləns/ *noun,* also corpulency /ˈkɔːpjʊːlənsɪ/
گۆشتنی، بەخۆوەیی، قەڵەوی ◌ چاقی، فربهی

**corpulent** /ˈkɔːpjələnt, US ˈkɔːrp-/ *adjective*
قەڵەو، گۆشتن، بەخۆوە، obese ) corpulently *adv*) ◌ چاق، فربه

**cor pulmonale** /ˌkɔː pʌlməˈnɑːli, -eɪli/ *noun*
(پزشکی) گەورەبوونەوەیێکی نائاسایی لای ڕاستی دڵ، لە ئەنجامی نەخۆشی سییەکان یان ڕەگەکانی خوێنی سی ◌ کور پولمونالی

**corpus** /ˈkɔːpəs, US ˈkɔːrpəs/ *noun, pl.* corpora or corpuses
1 لەش، تەن، لاشە (ب.ت. کەلاک) 2 کۆمەڵە (بەرهەم، قانوون و هتد) 3 سەرمایە، دەسمایە، مایە 4 (زمانەوانی) کۆرپۆس، پەیکەرە، لاشە ◌ 1 جسم 2 مجموعه 3 سرمایه 4 پیکره

**corpus allatum** *noun, pl.* corpora allata
(توێکاری) لاشەبالینە، تەنەبالینە: جووتێ شتی پانووساو یا لێکجیا لە زۆر مێرووداکە هۆرمۆنی (هی لاوێتی) دەردەکا ◌ کورپوس آلاتوم

**corpus callosum** /kəˈləʊsəm/ *noun, pl.* corpora callosa /-sə/
(توێکاری) لاشەگەمرینە، لاشە یان تەنی پینەیی: بەستێکی پانی ڕیشاڵە دەمارییەکانی هەردوو لای مێشک ◌ کورپوس کالوسوم

**corpus cavernosum** /ˌkævəˈnəʊsəm/ *noun, pl.* corpora cavernosa /-sə/
(توێکاری) لاشەبۆشینە، تەنەهۆلۆلینە، کۆرپۆس کافێرنۆسۆم: هەریەک لەو دوو کۆمەڵکە شانەی ڕەپەنی erectile کە ئەندازەی چووک و مێتکە پێکدێنێ ◌ کورپوس کاورنوسوم

**Corpus Christi** /ˌkɔːpəs ˈkrɪsti/ *noun*
لەشی کریست: بەرێوەبردنی جەژنی شێوی خواوەندی، پێنجشەممەی پاش یەکشەممەی ترینیتی دەگیرێ ◌ بدن مسیح، کورپوس کریست

**corpuscle** /ˈkɔːpʌsl, US ˈkɔːrp-/ *noun*
1 (رووەکناسی) تەن یان لاشەیێکی چکۆلەی (ژینو) زیندەوەری، ب.ت. خرۆکەی سوور یا سپی، خرۆکە، خرپلە، لاشۆچکە، لاشەیچکۆلە، لاشەلە، خانەیێکی زیندە 2 (مێژوویی) پارچۆلکەیێکی ورد کە وەک پێکهێنەری بنەڕەتی basic constituent ماک matter و ڕۆشنایی light دادەنرا (بنەڕەت: لە *corpusculum* لاتین "لاشەی چکۆلە"، چکۆلێنراوی *corpus*) ◌ 1 گلبول، جسم کوچک 2 کورپوسل

**corpusclular** /kɔːˈpʌskjʊlə/ *adjective*
خرۆکەیی، سەربە کۆرپاسل یان کۆرپۆسل ◌ گلبولی

**corpus delicti** /dɪˈlɪktʌɪ/ *noun, pl.* corpora delicti
(ماف) سەرجەم ئەو ڕاستی و فاکت و بارودۆخەی کە شکاندنی قانوون دەخاتەڕوو ◌ کورپوس دلیکتی

**corpus juris** *noun*
سەرجەمی یا کۆمەڵەی قانوونەکان (ی شارێ) ◌ مجموعەی قوانین

**corpus luteum** /ˈluːtɪəm/ *noun, pl.* corpora lutea /ˈluːtɪə/
(توێکاری) لاشەزەردینە، تەنەزەردینە، کۆرپۆس لوتیۆم، تەنی زەردی هێلکەدان ◌ کورپوس لوتیوم

**corpus luteum hormone** *noun*
هۆرمۆنی لاشەزەردینە یان تەنەزەردینە ◌ هورمون کورپوس لوتیوم

**corpus meristem** *noun*
لاشەدابەشان، تەنەدابەشان، لاشە یان تەنی مێریستێم ◌ کورپوس مریستم

**corpus spongiosum** /ˌspʌndʒɪˈəʊsəm/ *noun, pl.* -ora spongiosa /-sə/
(توێکاری) لاشەکونینە، تەنەکونکونە: کۆمەڵکەیێکی شانەی ڕەپەنی erectile لاشەبۆشینەکان corpora cavernosa ی چووک penis کە لە glansدا دەبڕێتەوە ◌ کورپوس اسپونجیوسوم

**corpus striatum** /strʌɪˈeɪtəm/ *noun, pl.* corpora striata /-tə/
(توێکاری) لاشەهێڵینە، تەنەهێڵینە: بەشێ لە گرێ بنکییەکانی مێشک، نێوکە نیسکۆڵەیی و کلکدارەکان پێکدێنێ ◌ کورپوس استریاتوم

**corral** /kəˈrɑːl, US -ˈræl/ *adjective*

1 تەویلەی پەرژینە یا پەرژینبەند، حەوشە، پەرژینە، جێ‌مۆڵی تاماندار، سەرگیر 2 (مێژوویی) حەوشە یان دیواربەندێک (کە) بۆ بەرگری لە واگۆن و عەرەبەکان ساز دەکرێت؛ حەوشەیێک کە لەودا گیانەوەرە درندە و کێویەیەکان دەخەنە گیرەوە ۞ 1 اصطبل روباز 2 کورال

**corrasion** *noun*
داسووان، سووان، خورانەوەی سروشتی (بە با و ئاو) ۞ کندوساب

**correct** /kəˈrekt/ *adjective*
1 دروست، راست، بێ‌هەڵە، ساغ، ورد 2 بەجێ، بەرێ‌وجێ، شیاو، گونجاو، باش، ژیرانە ۞ 1 درست، صحیح، دقیق 2 مناسب، شایسته، معقول

**correctable** *adjective*, also correctible /kəˈrektəbl/
لەراستکردنەوەهاتوو، راستی‌هەڵگر، راست دەکرێتەوە ۞ تصحیح‌پذیر

**correction** /kəˈrekʃn/ *noun*
1 راستکردنەوە، چاککردن، چاکردن، چێ‌کردن، دروستکردن، چاکسازی 2 هەڵەچنی، هەڵەگرتن، بژارکەری 3 دەرمان، چارە، چارەسەری 4 بیراز، تەمێ‌کردن، تەزاندن، سزادان، تاشان ۞ 1 تصحیح، اصلاح 2 غلط‌گیری 3 درمان، علاج 4 تنبیه

**correctional** /kəˈrekʃənl/ *noun*
1 سزادەرانە، تەزێنەرانە 2 راستکردنەوەیی ۞ 1 تنبیهی 2 تصحیحی

**correction fluid** *noun*, also correcting fluid
هەڵەسڕە، لاک یا شلەی هەڵەگری یا هەڵەپۆشی ۞ مایع غلط‌گیری

**correctitude** /kəˈrektɪtjuːd/ *noun*
رەفتارباشی، هەڵسوکەوتی باش ۞ حسن سلوک

**corrective** /kəˈrektɪv/ *adjective, noun*
*adj* سزادەرانە، چاکردنەوەیی، راستکردنەوەیی، راستکاری‌یانە *n* راستکردنەوە، راستکاری ۞ *adj* تأدیبی، اصلاحی *n* تعدیل

**correctly** /kəˈrektki/ *adverb*
بە دروستی، بە راستی: *Have you spelled it correctly?* ۞ به طور صحیح

**correctness** /kəˈrektnəs/ *noun*
دروستی، راستی، راستبوون ۞ صحت

**corrector** *noun*
راستکەرەوە، هەڵەگر، هەڵەسڕ ۞ تصحیح‌کننده

**correlated** *adjective*
پێکەوەبەستراو، پێکەوەگرێدراو ۞ همبسته

**correlation** /ˌkɒrəˈleɪʃn, US ˌkɔːr-, ˌkɑːr-/ *noun*
1 کۆپێوەندی، پێکەوەبەستراوی، سەربەیەکبوون، پێوەندی دوولایەنە، پێکبەندی، پێکبەستی، پێکەوەگرێدراوی: *There is a direct correlation between exposure to sun and skin cancer* 2 پێوەندی، تێکەڵی ۞ 1 همبستگی 2 ارتباط

**correlation diagram** *noun*
هێڵکاری پێکبەندی یان پێکەوەبەستراوی ۞ نمودار همبستگی

**correlation energy** *noun*
وزەی پێکبەندی یان پێکەوەبەستراوی ۞ انرژی همبستگی

**correlative** /kəˈrelətɪv/ *adjective, noun*
*adj* 1 پێکەوەبەستراو، پێکبەند، پێکبەست، جووت، سەربەیەک، پێکەوەبەند، پێکەوەپێوەندیدار 2 (رێزمان) پێک(ەوە)بەند، پێوەندی‌دەربڕ *n* وشە یا چەمکی پێک(ەوە)بەند ۞ *adj* 1 لازم و ملزوم 2 (دستور زبان) همبسته *n* واژه یا مفهوم همبسته (correlatively *adv*)

**correspondence** /ˌkɒrəˈspɒndəns, US ˌkɔːrəˈspɑːn-, ˌkɑː-/ *noun*, also correspondency
1 (پێکەوە) گونجان، سازان، بەرامبەری، پێکخواردن، لێکهاتن، جووت‌بوون، یەککەوتن، پێکهاتن، رێککەوتن، یەکگرتنەوە، یەکانگیری 2 لێکچوون، هاوشێوەیی، شێوەی یەکدان، وەک‌یەکی 3 نامەنووسی، نامەگۆڕینەوە، نامەکان 4 (بیرکاری) هاوتایی ۞ 1 مطابقت، تطابق 2 شباهت، تشابه 3 مکاتبه، مکاتبات 4 تناظر

**correspondence course** *noun*
سەروبەند یان قۆناخی نامە(پێک)گۆڕینەوە ۞ دورەی مکاتبه‌ای

**correspondent** /ˌkɒrəˈspɒndənt, US ˌkɔːrəˈspɑːn-, ˌkɑː-/ *adjective, noun*
*adj* 1 یەککەوتوو، رێککەوتوو، سازاو، گونجاو، لێکهاتوو، یەکگرەوە، هاوگیر، جووت، بەرامبەر 2 لێکچوو، هاوشێوە 3 (بیرکاری) هاوتا *n* 1 پەیامنێر، هەواڵنێر 2 نامەنووس 3 بەرامبەر، لایەن (سەودا و مامەڵە) ۞ *adj* 1 مطابق، منطبق، موافق 2 مشابه، همانند 3 متناظر *n* 1 خبرنگار 2 مکاتبه‌کننده 3 طرف معامله

**corresponding** /ˌkɒrəˈspɒndɪŋ, US ˌkɔːrəˈspɑːn-, ˌkɑː-/ *adjective*
1 تا، وێنە 2 بەقەدیەک، بەرامبەر، گونجاو لەگەڵ: *corresponding parts of similar triangles* 3 (بیرکاری) هاوتا 4 یەککەوتوو، رێککەوتوو، سازاو، گونجاو 5 لێکچوو، هاوشێوە 6 نامەنووس ۞ 1 قرینه، نظیر 2 هم‌تراز، معادل، متناسب با 3 متناظر 4 موافق 5 مشابه 6 مکاتبه‌کننده

**correspondingly** /ˌkɒrəˈspɒndɪŋli, US ˌkɔːrəˈspɑːn-, ˌkɑː-/ *adverb*
هەروەها، هەروەک ۞ متقابلاً، همان‌طور

**corrida** /kɒ'ri:də/ *noun*
(له سپانیاییەوه) گاسواری، شەڕەگا، شەڕەکەڵ ◌ گاوبازی

**corridor** /'kɒrɪdɔ:(r), US 'kɔ:r-, 'kɑ:r-/ *noun*
1 (جوگرافیا) دالان، کاریدۆر، کۆریدۆر 2 نێقکۆ، دالان، ڕێڕەو، ڕاڕەو: *His room is along the corridor* ◌ 1 دالان (جغرافیا) 2 دهلیز، کریدور

**the corridors of power** *noun, pl.*
ناوەندەکانی بڕیاردان، ناوەندەکانی دەسەڵات ◌ مراکز قدرت

**corrie** /'kɒri, US 'kɔ:ri, 'kɑ:ri/ *noun, pl.* corries
کەورگ، ئەشکەوت، cirque، ب.ت. هی کێوەکانی سکاتلەند ◌ غار

**corrigenda** /-də/ *noun, pl*
هەڵەنامە ◌ غلطنامه

**corrigendum** /ˌkɒrɪ'dʒendəm, US ˌkɔ:r-, ˌkɑ:r-/ *noun, pl.* corrigenda /-də/
1 هەڵەی ڕاستەوەکراو 2 لیستەی یان خشتەی دروست و نادروستەکان ◌ 1 مورد اصلاحی 2 فهرست لغزشها

**corrigibility** /ˌkɒrɪdʒɪ'bɪləti/ *noun*
لەچاکردنهاتوویی ◌ اصلاحپذیری

**corrigible** /'kɒrɪdʒɪb(ə)l/ *adjective*
لەچاکردنهاتوو، چاک دەبێ، چاک دەبێتەوە، ڕاست دەکرێتەوە، reparable: *a corrigible defect* ◌ اصلاحپذیر

**corroborant** /kə'rɒbərənt/ *adjective*
هێزپێدەر، هێزێنەر، گوڕجکەرەوە، بەهێزکەر ◌ نیروبخش

**corroborated** *adjective*
1 بەهێزکراو، بەپێزکراو، هێزێنراو 2 سەلمێنراو، پشتڕاستکراو ◌ 1 تقویتشده 2 اثباتشده

**corroboration** /kəˌrɒbə'reɪʃn, US -ˌrɑ:bə-/ *noun*
1 پەسندکردن، مۆرکردن، سەلماندن، باوەڕاندن، باوەڕیپێدان، پشتڕاستکردن، بەڕاستدانان 2 بەڵگەی زیادی، بەڵگەیەکی تر (corroborator *n*) ◌ 1 تأیید، اثبات، توثیق 2 دلیل دیگر

**corroborative** /kə'rɒbərətɪv, US kə'rɑ:bəreɪtɪv/ *adjective,* also corroboratory
پەسندکەر، سەلمێنەر، پشتڕاستکەر ◌ تأییدکننده، اثباتکننده

**corroboree** /kə'rɒbəri/ *noun*
ڕێوڕەسمێکی هەڵپەڕکێلەگەڵی خەڵکی ڕەسەنی ئەوسترالیا، بە شێوەی سروتێکی پیرۆز یان کۆبوونەوەیێکی نافەرمی ◌ کاروبوری

**corroded** *adjective*
ڕزیو، داخوراو، ژەنگهەڵێناو، پوواو، خۆرەتێداو ◌ خوردهشده

**corrodible** /kə'rəʊdɪbl/ *adjective*
لەخورانەوەهاتوو، لەداخورانهاتوو ◌ قابل خوردگی

**corroding** *adjective*
ڕزێنەر، لەنێوبەر، فەوتێنەر، خۆرە، خۆرکە ◌ تحلیلبرنده

**corrosion** /kə'rəʊʒn, US -'roʊ-/ *noun*
1 خورانەوە، داخوران، ڕزان، ڕزین، پووان 2 ژەنگهەڵێنان، ژەنگ، مۆرانە، کورمووری 3 تیاچوون (بەرەبەرە)، فەوتان، لەبنهاتن، لەنێوچوون ◌ 1 خوردگی، فرسایش 2 زنگزدگی، زنگ 3 تباهی

**corrosive** /kə'rəʊsɪv, US -'roʊ-/ *adjective, noun*
1 *adj* ڕزێنەر، داخورێنەر، ژەنگ(پێ)هەڵێنەر، داخۆر: *corrosive action* ◊ *corrosive acids* 2 بەزیان، ماڵوێرانکەر، خراپ، موزیر: *the corrosive effects of salt water* ◊ *the corrosive effects of alcoholism* ◊ *Unemployment is having a corrosive effect on our economy* *n* مەتریاڵی ڕزێنەر یان داخورێنەر (corrosively /kə'rəʊsɪvli, US -'roʊ-/ *adv*) ◌ *adj* 1 فرساینده 2 مخرب، مضر *n* مادهی فرساینده

**corrosiveness** /kə'rəʊsɪvnəs, US -'roʊ-/ *noun*
داخوران، خورانەوە ◌ خورندگی

**corrugated** /'kɒrəgeɪtɪd, US 'kɔ:r-, 'kɑ:r-/ *adjective*
چرچ، چیناوی، چینچین، هەڵقرچاو، لۆچ، چرمقی، چاڵوچۆڵاوی، قەدقەد، دێراودێراو، دەڕابەیی، کووزکووز، شەپۆلاوی، لولو، ڕێڕێ: *a corrugated* ◊ *corrugated iron roof* ◊ *corrugated cardboard* ◌ چیندار، دارای موج

**corrugated cardboard** *noun*
مقەبای قەدقەد یان لولو، مقەبای ڕێڕێ ◌ مقوای زنبوری

**corrugated iron** *noun*
ئاسنی دێراودێراو یان چاڵوچۆڵاوی، ئاسنی ڕێڕێ، ئاسنی دەڕابەیی ◌ آهن موجدار

**corrugated roof** *noun*
سەربانی چاڵوچۆڵاوی، سەربانی دەڕابەیی، ڕێڕێ، سەربانی لولو، بانەدێراو، بانەڕێڕێ ◌ بام موجدار

**corrugation** /ˌkɒrə'geɪʃn US ˌkɔ:r-/ *noun*
پۆت، قەد، لۆ، لۆچی، چین، کۆڵ، چرچی، هەڵقرچان، قەدکراوی، ڕێڕیی، کۆڵکۆڵ، لولویی، دێراو، شوێن، کووز ◌ چین، چروک، تاخوردگی، شیار

**corrupt** /kə'rʌpt/ *adjective*
1 خراپ، گەندەڵ، بەرتیلخۆر: *a corrupt*

*corrupt officials accepting bribes ◊ regime*
*The whole system is* :2 هەرزە، جلف، شیرزە
*corrupt practices ◊ inefficient and corrupt*
3 گۆڕاو، دەسکاریکراو، پڕ لە هەڵە، هەلاوی،
پڕخەوش (زمان، دەق و هتد؛ corruptly
(/kə'rʌptli/ *adv* ۞ 1 فاسد، رشوەخوار 2 مبتذل
3 تحریف‌شده

**corruptibility** /kə,rʌptə'bɪlɪti/ *noun*
1 فەساد، خراپبوون، گەندەڵی، داڕزان،
بەرتیلخۆری 2 هەرزەیی، جلفی، شپرزەیی ۞
1 فساد، رشوەخواری 2 ابتذال

**corruptible** /kə'rʌptəbl/ *adjective*
1 خراپ، فاسد، گەندەڵ، داڕزاو، بەرتیلخۆر 2
هەرزە، جلف، شپرزە ( corruptibly
(/kə'rʌptəbli/ *adv* ۞ 1 فاسد، رشوەخوار 2
مبتذل

**corruption** /kə'rʌpʃn/ *noun*
1 گەندەڵی، فەساد، خراپبوون، بەرتیلخۆری:
2 *allegations of bribery and corruption*
لادان، خریایی، لەڕێدەرچوون، depravity:
*He claimed that sex and violence on TV*
3 *led to the corruption of young people*
هەڵوەشانەوە، تێکچوون، شێواندن،
چەواشەکردن، دەسکاری(کردن) 4 فەوتاندن،
تیابردن، لەنێوبردن 5 بۆگەنبوون، گەنین، رزین،
داقنین، پووان، داڕزان، decomposition،
decay ۞ 1 فساد، ارتشا 2 انحراف 3 فروپاشی،
تحریف، مسخ 4 تباه‌سازی 5 تعفن، پوسیدگی

**corruptive** /kə'rʌptɪv/ *adjective*
فەوتێنەر، داڕزێنەر ( corruptively
(/kə'rʌptɪvli/ *adv* ۞ تباه‌کننده

**corruptiveness** /kə'rʌptɪvnəs/ *noun*
فەوتان، تیاچوون، بەرتیلخۆری ۞ تباهی،
رشوەخواری

**corrupt practices** *noun*
بەرتیلخۆری ۞ ارتشا

**corsac fox** /'kɔ:sak/ *noun*
جۆرێ ڕێوی کە لە ستێپەکانی ناوەندی ئاسیادا
دەبینرێ [*Vulpes corsac*] (بنەڕەت: لە *karsak*
تورکیکەوە) ۞ نوعی روباه

**corsage** /kɔ:'sɑ:ʒ, US kɔ:r'sɑ:ʒ/ *noun*
1 چڵەگوڵ یان چەپکەگوڵ (کراسی ژنانە،
ب.ت. لە شاییدا) 2 سەربالا (جلی ژنانە؛
بنەڕەت: لە *cors* فەرەنسی کۆن "لەش"، لە
*corpus* لاتین) ۞ 1 شاخه گل 2 بالاتنه

**corsair** /kɔ:'sɛ:, US 'kɔ:sɛ:/ *noun*
1 چەتەی دەریایی، دەریاگران 2 کەشتی چەتەی
دەریایی (پەلاماریان دەبردەسەر وڵاتانی
ئەوروپایی، ب.ت. لە کەناری ئەفریکای
باکووری چالاکییان بوو) ۞ 1 دزدان دریایی 2
کشتی دزدان دریایی

**Cor Scorpii** *noun*
(ئەستێرەوانی) دڵی دووپشک ۞ قلب عقرب

**corse** /kɔ:s/ *noun*
(کۆن) کەلاک، لاشە، تەرم، مردە ۞ جسد،
مردار، نعش، مرده

**corselet** /kɔ:sə'let, kɔ:rs-, 'kɔ:sələt, 'kɔ:rs-/ *noun*
1 (مێژوویی) زرێ بێقۆڵ، زرێی سنگ 2 سنگی
مێروو ۞ 1 زره بی‌آستین 2 سینه‌ی حشره

**corselette** /,kɔ:s(ə)'lɛt, US 'kɔ:s(ə)lɛt/ *noun*, also corselet
جلێکی ژنانە کە بریتییە لە مەمکبەند و
زگبەند ۞ کورسلت

**corset** /'kɔ:sɪt, US 'kɔ:rsɪt/ *noun*
زگبەست، زگبەند، پشتێن، کەمەربەن ۞ گن،
شکم‌بند

**Corsican** /'kɔ:sɪkən/ *noun, adjective*
*n* 1 خەڵکی Corsica 2 زمانی کورسیکا، لە
بنەڕەتا زاراوەیێ لە ئیتالیایی بووە *adj* سەربە
کورسیکا یا زمانەکەی ۞ کورسیکایی

**cortege** /kɔ:'teʒ, -'teɪʒ, US kɔ:r'teʒ/ *noun*
(ناشتن) لەگەڵچووان، بەڕێکەران، کاروانە،
تەرمنێژان ۞ مشایعت‌کنندگان

**Cortes** /'kɔ:tɛs, -z, Spanish 'kortes/ *noun*
ئەنجومەنی قانووندانانی سپانیا و جاران هی
پورتوگالیش ۞ کورتس

**cortex** /'kɔ:teks, US 'kɔ:rt-/ *noun, pl.* cortices /-tɪ,si:z/
1 توێکڵ، توێکڵی مێشک، توێکڵی دەماخ 2
پێست، توێخڵ، توخڵ، توێکڵ 3 توێکڵ یان
پێستی گورچیلە (بنەڕەت: لاتین "bark") ۞ 1
قشر، قشر مخ 2 پوست، پوسته 3 پوست کلیه

**cortical** /'kɔ:tɪkl, US 'kɔ:rt-/ *adjective*
1 سەربە توێکڵی مێشک 2 پەردەیی ۞ 1
وابسته به قشر مخ 2 غشائی

**corticate** /'kɔ:tɪkeɪt/ *adjective*, also corticated /'kɔ:tɪkeɪtɪd/
توێکڵدار ۞ دارای پوسته

**corticosteroid** /,kɔ:tɪkəʊ'stɪərɔɪd, -'stɛrɔɪd/ *noun*
(زیندەکیمیا) کۆمەڵێ لە هۆرمۆنە ستێرۆیدەکان
کە لە adrenal cortex بەرهەم دێترێن یان
دەردەدرێن ۞ کورتیکواستروئید

**corticosterone** /,kɔ:tɪkəʊ'stɛrəʊn/ *noun*
(زیندەکیمیا) هۆرمۆنێ کە لە لایەن توێکڵی
ژوورگورچیلەییەوە دەردەدرێن،
کورتیکۆستێرۆیدێکی کریستاڵی بێڕەنگ
$C_{21}H_{30}O_4$ کە لە پرۆتێین و میتابۆلیزمی
کاربۆهایدرایتدا گرنگە ۞ کورتیکواسترون

**corticotrophin** /,kɔ:tɪkə(ʊ)'trəʊfɪn/ *noun*, also corticotropin /-pɪn/ = (Biochemistry)

adrenocorticotrophic hormone

**cortisol** = (Biochemistry) hydrocortisone

**cortisone** /ˈkɔːtɪzəʊn, -səʊn, US ˈkɔːrtəsoʊn, -zoʊn/ *noun*
کــــۆرتیزۆن $C_{21}H_{28}O_5$ (= هۆرمۆنـــێن بـــۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی جومگەسوێ بـــەکاردێ و لـــە لایـــەن تونێکـــلی زوورگورچیلـــەییـــیەوە adrenal cortex دەردەدرێ: بنـــەڕەت: لـــە نـــاوی توخمـــە کیمیـــاییـــەکـــانی -17-hydroxy-11 (dehydrocorticosterone ۞ کورتیزون

**Cortland** *noun*
جۆرێ سێوی ناوداری تویخسوور ۞ نوعی سیب

**corundum** /kəˈrʌndəm/ *noun*
کوراندۆم، بەردەساو (= بەردێکی کریستالیزەی سەختە کە بۆ ساوینەوە یان بریقەپێدانەوە بەکار دێنرێ) ۞ کوراندُم

**coruscant** *adjective*
درەوشاوە، بریقەدار، بریسکەدار، چریسکەدار ۞ درخشان

**coruscating** /ˈkɒrəskeɪtɪŋ, US ˈkɔːr-, ˈkɑːr-/ *adjective*
درەوشـــــاوە، بریقـــــەدار، بریـــــسکەدار، چاوبەشەوارەخەر: -*ting wit* ( **coruscatingly** /ˈkɒrəskeɪtɪŋli, US ˈkɔːr-, ˈkɑːr-/ *adv*: (*coruscatingly brilliant* ۞ درخشان

**coruscation** *noun*
1 درەوشـــانەوە، بریـــسکانەوە، بروســـکانەوە، گـــەشـــانەوە، تروسـکانەوە 2 پریـــشکە ۞ 1 درخشش، تلألو 2 جرقه

**corvée** /ˈkɔːveɪ/ *noun*
1 (مێژوویی) بێگار، زبارە 2 بێگاری سەپێنراو لە بـــری بـــاج (ب.ت. بـــۆ دروســـتکـــردن یـــان چاککردنەوەی شارێ highway) ۞ بیگار، سخره

**corves** = plural form of corf

**corvette** /kɔːˈvet, US kɔːrˈvet/ *noun*
کەشتی شەڕکەری خێرا ۞ کوروِت

**corvid** /ˈkɔːvɪd/ *noun*
(باڵندەناســـی) قەلەڕەشـــە، قـــالاو، تیرەقـــالاو (Corvidae) ۞ کلاغ، غرابی

**corvine** /ˈkɔːvaɪn/ *adjective*
قەلەڕەشەناسا، وەکووقالاو ۞ کلاغمانند

**Corvus** /ˈkɔːvəs/ *noun*
(ئەســـــتێرەوانی) قـــــالاو(ە)، کۆرڤـــــۆس: کۆئەستێرەیێکی بچوک بە Virgoوە لە باشوور نووساوە و چوار ئەستێرەی پرشنگداری تیایە ۞ غراب

**Corybant** *noun, pl.* Corybants or Corybantes
کۆریبانـت: یـەکـێ لـە قـەشـە یـان بـەشدارانی جـــەژنی Cybele، کـــە ئـــەریـــت و ســـروت و ڕێوڕەسمێکی پرسۆز و توند و شێتانەیان بەڕێوە برد ۞ کوریبانت

**corybantic** /ˌkɒrɪˈbantɪk/ *adjective*
دڕ، کێوی، پەلاماردەر، شێت، هەوسارپساندوو ۞ وحشی، دیوانه

**corydalis** /kəˈrɪdəlɪs/ *noun*
(رووەکناســـی) گیـــا یـــان رووەکێکـــی herbaceous شـاتەرە [*Corydalis lutea* (هی زەرد) و جۆرە پێوەندیدارەکان] ۞ شاهتره

**corymb** /ˈkɒrɪmb/ *noun*
(رووەکناســـی) هێـــشوو(ک؛ بنـــەڕەت: لـــە *corymbe* فەرەنســـی یـان *corymbus* لاتین، لە *korumbos* یۆنانی "هێشوو") ۞ دیهیم

**corymbolike** *adjective*
شـــێوەهێـــشوو(ک)، هێـــشوو(ک)ئاســـا، هێـشوو(ک)ی(ـــی)، هێـــشوو(ک)ـــانە، لـــە هێشوو(ک) دەچێ ۞ دیهیمانند، دیهیموار

**corymbose** *adjective*, also corymbous
هێـشوو(ک)دار، خـاوەن هێـشوو(ک) ۞ دارای دیهیم، دیهیمدار

**corynebacterial** *adjective*
گـوزەبـەکتریـایی، گـورزەمیلیـزەیـی، سـەربـە گورزەمیلیزە، کۆرینباکتریۆمی، کۆرینباکتریایی ۞ وابسته به کورینباکتریم

**corynebacterium** /ˌkɒrɪnɪbakˈtɪərɪəm, kəˌrɪn-/ *noun, pl.* corynebacteria /-rɪə/
گـوزەبـەکتریـا، گـورزەمیلیـزە، کـۆرینبـاکتریۆم، کۆرینباکتریا: بەکتریای توخمێ کە دووشاخەی diphtheria لـــێدەکـــەوێتـــەوە [تـــوخم *Corynebacterium*] (لاتینی نوێ، لە *korunē* یۆنانی "bacterium + "club) ۞ کورینباکتریم

**coryphaeus** /ˌkɔːrɪˈfiːəs, US ˌkɑːr-/ *noun, pl.* coryphaei
1 سەردەستە، سـەرتیپ 2 پێشەوای پارتی یـان ڕیبازێکی هزری ۞ 1 سردسته 2 زعیم حـزب و مکتب فکری

**coryphée** /ˈkɒrɪfeɪ/ *noun, pl.* coryphées
(لـــە ballet) ژنەســـەماکەر، ژنـــەرەخس کـــێنش (بنـەڕەت: بـە ڕێگـای لاتـین لـە *koruphaios* یۆنـــانی "ڕێـــەری کـــۆر coryphaeus"، لـــە *koruphē* "سەر") ۞ رقاصه

**coryza** /kəˈraɪzə/ *noun*
هەلامـەت، پەسـیو، چـلمەشۆری، پـەژیک (لـە ئـەنجامی سـەرماوە؛ بنەڕەت: لە لاتینەوە، لە *koruza* "nasal mucus" یۆنانییەوە) ۞ زکام

**coryzal** *adjective*
سەربە هەلامـەت، هەلامـەتی، پەسیوی، پـەژیکی ۞ زکامی، وابسته به زکام

**cos**[1] /kɒs/ *noun*
(رووەکناسی) کاهوو، خاس ۞ کاهو

**cos**[2] *abbreviation* 1 cosine 2 companies 3

consul; consulship 4 counties

**cos**[3] /kɒz, US kəz/ *abbreviation* because
(نافــەرمی) چونکــە، کورتــەی because ۞ کورتەنوشت because

**Cosa Nostra** /ˌkəʊzə ˈnɒstrə/ *noun*
ریکخراوەیێکـی تـاوانکـاری لـە ئـەمریکا، لـە شێوەی مافیا و پێوەندیشی پێوە هەیە (بنەڕەت: لە ئیتالیاییەوە بـە واتـای "کاروبارمان") ۞ کوسا نوسترا

**cosec** /ˈkəʊsɛk/ *abbreviation* cosecant

**cosecant** /kəʊˈsiːk(ə)nt, US -ˈsɛk-/ *noun*
کۆسیکانت، بڕەری تەواو، پێچەوانەی سینوس ۞ کسکانت

**cosh** /kɒʃ, US kɑːʃ/ *noun*
(نافەرمی) تێلا، داردەست، گۆپاڵ ۞ باتون

**co-signatory** *adjective, noun*
پێکەوەمۆرکـەر، پێکەوەئیمزاکـەر (یـەک، دوو کەس یان زیاتر کە بەڵگەنامەیەکی فەرمی مۆر دەکەن) ۞ امضاکنندەی مشترک

**cosine** /ˈkəʊsaɪn, US ˈkoʊ-/ *noun*
(بیرکاری) کۆسین، بەریەکتەواو ۞ کوسین

**cos lettuce** /ˌkɒs ˈletɪs, ˌkɒz, US ˌkɑːs, ˌkɔːs/ *noun*
(رووەکناسی) کاهوو، خاس ۞ کاهو

**cosmetic** /kɒzˈmetɪk, US kɑːz-/ *adjective, noun*
1 *adj* جوانکارانە، ئاڕایشتی: *the cosmetics industry* 2 رواڵـەتی، رووکەشـی، نابنچینـەیی، سەرسەرەکی *n* مەتریالی جوانکردن، کەرەسەی جـوانی یـان ئاڕایـشت، جوانەمـەنی ۞ 1 *adj* آرایشی 2 صوری *n* اسباب آرایش

**cosmetically** /-kli/ *adverb*
لەباری ئاڕایشتی یان جوانکارانەوە ۞ از لحاظ آرایشی

**cosmetician** /ˌkɒzməˈtɪʃ(ə)n/ *noun*
پـسپۆر یـان تایبـەتکـاری جـوانی، فرۆشـەری کەلوپەلی جوانکردن ۞ متخصص زیبایی، فروشندەی وسایل آرایش

**cosmetics** *noun, pl.*
کەلوپەل یا شتومەکی جوانی یا ئاڕایشت، جوانەمەنی ۞ اسباب آرایش

**cosmetic surgery** *noun*
بـرینکـاری یـان نەشـتەرگەری پلاسـتیک ۞ جراحی پلاستیک

**cosmetology** /ˌkɒzmɪˈtɒlədʒi/ *noun*
جوانکاری، رازێنەری (*adj* cosmetological: سـەربە جـوانکـاری، سـەربە رازێنـەری؛ *n* cosmetologist: جـوانکـار، رازێنـەر) ۞ آرایشگری

**cosmic** /ˈkɒzmɪk, US ˈkɑːz-/ *adjective*
1 گـەردوونی، سـەربە گـەردوون، جیهـانی، گشجیهانی 2 یەکجارگەورە، یەکجارگرنگ ۞ 1 کیهانی، جهانی 2 بسیار عظیم، بسیار مهم

**cosmic beliefs** *noun, pl.*
باوەڕە گەردوونییەکان ۞ اعتقادات کیهانی

**cosmic bodies** *noun, pl.*
تەنە گەردوونییەکان ۞ اجرام کیهانی

**cosmic consciousness** *noun*
هۆشیاری یا ئاگایی گەردوونی ۞ آگاهی کیهانی

**cosmic dust** *noun*
تۆزی گەردوونی ۞ غبار کیهانی

**cosmic light** *noun*
رۆشنایی یان رووناکی گەردوونی ۞ نور کیهانی

**cosmic order** *noun*
ریک(وپێک)ی گەردوونی ۞ سامان کیهانی

**cosmic rays** *noun, pl.*
تیشکە گەردوونییەکان ۞ پرتوهای کیهانی

**cosmic series** *noun*
زنجیرەی گەردوونی ۞ سلسلەی کیهانی

**cosmo-** /ˈkɒzməʊ/ *prefix*
پێشگر: گـەردوون، گـشجیهان: *cosmography* (بنـەڕەت: لـە *kosmos* یۆنـانییـەوە " order, world") ۞ پیشوند: کیهان

**cosmobiology** *noun*
زینـدەناسـی گـەردوونی، گـەردوونزینـدەناسـی، کۆسمۆبایۆلۆژی: لقێ لە زیندەناسـی کە لەمەڕ بارودۆخی ژیان لە گەردوونا و کاریگەری ژیانی گەردوونی لەسەر ژیانی سەرعەرز دەکۆڵێتەوە ۞ زیستشناسی کیهانی

**cosmochemistry** *noun*
کیمیـای گـەردوون(ی): زانـستی لێکۆڵـینەوەی رووداو و بلاوبوونـەوەی تـوخم و رەگـەزە کیمیـاییـەکـان لـەنێـو گـەردووندا (*adj* cosmochemical؛ *n* cosmochemist: کیمیازانی گەردوون) ۞ کوسموکمیستری

**cosmogenesis** /ˌkɒzmə(ʊ)ˈdʒɛnɪsɪs/ *noun*
پێکهـاتنی گـەردوون، گـەردوونپەیـدایی ۞ کیهانزایی

**cosmogonic** /-məˈgɒnɪk/ *adjective*
سەربە پێکهاتنی گەردوون ۞ وابستە بە کیهانزایی

**cosmogony** /kɒzˈmɒgəni, US kɑːzˈmɑːg-/ *noun, pl.* cosmogonies
پێکهـاتنی گـەردوون (ب.ت. کۆمەڵـەی خـۆری the solar system)، تیۆری پێکهاتنی گـەردوون ۞ کیهانزایی، نظریەی کیهانزایی

**cosmographer** *noun*
کازمۆگرافێر، کۆسمۆگرافێر ۞ کوسموگرافر

**cosmographic** *adjective, also* -mographical
سـەربە کـازمۆگرافی یـان گـەردوونۆگرافی ۞ وابستە بە کوسموگرافی

**cosmography** /kɒzˈmɒgrəfi, US kɑːzˈmɑːg-/ *noun, pl.* cosmographies

کازمۆگرافی، گەردوونۆگرافی (زانستی کە باسی چۆنیەتی گەردوون و پێکهاتنی گشت شتەکان دەکا و زانستەکانی ئەستێرەوانی، جوگرافیا و زەویناسی لەخۆدەگری) ۞ کوسموگرافی
**cosmoid scale** *noun*
پوولەکەی شفرەیی یان ماهی، پوولەکەی ددانفیلی ۞ فلس عاجی
**cosmological** /ˌkɒzməˈlɒdʒɪkl, US ˌkɑːzməˈlɑːdʒ-/ *adjective*, also -ic
گەردووناسی‌یانە، سەربە گەردووناسی ۞ کیهان‌شناختی
**cosmological assertion** *noun*
بڕیاری گەردووناسی‌یانە ۞ حکم کیهان‌شناختی
**cosmological cycle** *noun*
سووری گەردووناسی‌یانە ۞ دور کیهان‌شناختی
**cosmological proof** *noun*
بەڵگە یان پرووفی گەردووناسی‌یانە ۞ برهان کیهان‌شناختی
**cosmologist** /kɒzˈmɒlədʒɪst, US kɑːzˈmɑːl-/ *noun*
گەردووناس، جیهاناس ۞ کیهان‌شناس
**cosmology** /kɒzˈmɒlədʒi, US kɑːzˈmɑːl-/ *noun*
گەردووناسی، جیهاناسی ۞ کیهان‌شناسی
**cosmonaut** /ˈkɒzmənɔːt, US ˈkɑːz-/ *noun*
ئاسمانگەڕ، گەردوونگەڕ ۞ فضانورد
**cosmopolis** /kɒzˈmɒp(ə)lɪs/ *noun*
کازمۆپۆلیس، جیهانشار، جەهانشار ۞ کوسموپلیس
**cosmopolitan** /ˌkɒzməˈpɒlɪtən, US ˌkɑːzməˈpɑːl-/ *adjective, noun*
*adj* 1 جیهانی، گەردوونی 2 جیهانگیر، جیهانداگر، جیهانگرەوە، جیهاننیشتمان 3 بنیادەمی بەئەزموون، دنیادیتوو *n* مرۆڤ، گیا یان گیانەوەری جیهانی ۞ *adj* 1 جهانی 2 جهان‌شمول، جهان‌وطن 3 آدم باتجربه *n* کوسموپولیتن
**cosmopolite** /kɒzˈmɒp(ə)lʌɪt/ *noun*
1 گیا یان گیانەوەری کە لە هەموو جیهاندا دەس دەکەوی، جیهانزی، دنیازی، هەمەجی‌زی 2 هاووڵاتی جیهانی، کەسێ کە جیهان بە نیشتمانی خۆی دەزانێ (*n* cosmopolitism) ۞ 1 کوسموپولیت 2 اهل جهان
**cosmos**[1] /ˈkɒzmɒs, US ˈkɑːzmoʊs, -məs/ *noun*
گەردوون، جیهان، گێتی ۞ کیهان، کائنات، عالم
**cosmos**[2] /ˈkɒzmɒs, US ˈkɑːzmoʊs, -məs/ *noun, pl.* same or -moses
جۆرێ گیا لە تیرەی daisy، ڕەسەنی مەکسیک یام ناوچە گەرمەکانی ئەمریکا [توخم *Cosmos*] ۞ نوعی گیاه

**Cossack** /ˈkɒsak/ *noun*
1 قەزاق: ئەندامی گەلێکی باشووری رووسیا، ئۆکراین و سیبیریا، لەبەر شارەزایی لە ئەسپ‌سواری و کاروباری سەربازی جێی سەرنجن 2 ئەندامێکی یەکەی سەربازی قەزاق ۞ قزاق
**cosseted** *adjective*
نازدار، نازپەروەردە ۞ لوس
**cossie** *noun*, also cozzie. *pl.* cozzies
(نافەرمی) مایۆی مەلێ ۞ مایو
**cost**[1] /kɒst, US kɔːst/ *noun*
1 خەرج، خەرج‌وبار، تێچوون، بەخت، مەزاخ: ◊ *to reduce costs* ◊ *to cut costs* 2 بەها، نرخ، بایی: *running/operating/labour costs the high/low cost of housing* (costless /kɒstləs, US kɔːstli/ *adj*; costlessly /kɒstləsli, US kɔːstləsli/ *adv*) ۞ 1 هزینه، مخارج، خرج 2 قیمت
**cost**[2] /kɒst, US kɔːst/ = past and past participle of cost
**costa** *noun, pl.* costae /ˈkɒstiː/
1 (ڕووەکناسی و گیانەوەرناسی) پەراسوو، سیسی، دەندەل، ڕەگی نێوەڕاست midrib یان پێکهاتەیێکی پەراسووئاسا 2 (مێرووناسی) پەراسوو: بەشێ وەک ڕەگی نێوەڕاستی گەڵا یان ڕەگی پێشەوەی باڵی باڵندەیێ کە شێوەی پەراسوو دەدا (costal /ˈkɒstl, US ˈkɑːstl/ *adj*: سەربە یان پێوەندی بە costa ـەوە هەیە؛ بنەڕەت: لە لاتینەوە) ۞ 1 دنده 2 کوستا
**cost accounting** *noun*
تێچووندۆزی، هەڵسەنگاندنی خەرج‌وبار یان تێچوون، خەرجەوانی، مەزاخ‌دۆزی (cost accountant *n*: هەڵسەنگێنەری تێچوون یا خەرج‌وبار، خەرجەوان، مەزاخ‌دۆز، تێچووندۆز، خەرجەوان) ۞ حسابداری صنعتی
**costalgia** *noun*
ژانەپەراسوو ۞ درد دنده
**cost and production control** *noun*
کۆنترۆڵی خەرج‌وبار (تێچوون) و بەرهەمهێنان ۞ کنترل هزینه و تولید
**co-star** *noun*
هاونەکتەری ۞ هم‌بازی
**Costard** /ˈkɒstəd, US ˈkʌst-/ *noun*
جۆرێ سێوی زلەی چێشتی ۞ کوستارد
**Costa Rican** /ˈriːkən/ *noun, adjective*
*n* خەڵکی کاستاریکا، کۆمارێ لە ئەمریکای ناوەندی، کاستاریکایی *adj* سەربە کاستاریکا، کاستاریکایی ۞ کاستاریکایی
**cp** *abbreviation* 1 cerebral palsy 2 Communist Party
**co-staring** *noun*
بە بەشدار(بوون)ی (فیلم، شانۆ، و هتد) ۞ با

شرکت

**costate** /ˈkɒsteɪt/ *adjective*
پەلاوی، لادار، پەلپەل، پرلا، لالا ◌ مضلع

**cost-benefit** *noun*
تێچوون و قازانج، خەرج و قازانج، مەزاخ و مەفا ◌ هزینه و سود

**cost-benefit analysis** *noun*
شیکردنەوە یان تاوتوێ (کردن)ی تێچوون و قازانج، شیکردنەوەی خەرج و بەهرە ◌ تجزیه و تحلیل هزینه و سود

**cost-cutting** *noun*
کەمبوونەوەی خەرجوبار، کەمبوونەوەی تێچوون ◌ کاهش هزینه

**cost-effective** *adjective*, also cost-efficient
بەقازانج، خێردەرەوە، بەبەهرە، لەقازانجنزیک، سەربەخێر، بەخێر (cost-effectiveness *n*) ◌ باصرفه، مقرون به صرفه

**costermonger** /ˈkɒstəmʌŋgə(r), US ˈkɑːstərm-/ *noun*, also coster
سەوزە یا میوەفرۆشی دیوەرە (گەڕۆک) ◌ سبزی یا میوه‌فروش دوره‌گرد

**costing** /ˈkɒstɪŋ, US ˈkɔːst-/ *noun*
هەڵسەنگاندن یان نرخاندنی تێچوون (خەرجوبار) ◌ تخمین هزینه

**cost ladder** *noun*
پەیژەی خەرجوبار یان تێچوون، نەردیوانی خەرج(وبار) ◌ نردبان هزینه

**costive** /ˈkɒstɪv/ *adjective*
1 قەبز، گیر، گرفتدار، بەگرفت، مایەگیر، قەبزکەر، constipated 2 خاو لە کردار یان دەربڕیندا 3 نابەخشندە، گونکبژێر، stingy costiveness :costively /ˈkɒstɪvli/ *adv*) /ˈkɒstɪvnəs/ *n*: گیری، گرفت) ◌ 1 دچار یبوست، قابض 2 کند در عمل یا اظهارنظر 3 خسیس

**costliness** /ˈkɒstlinəs, US ˈkɔːst-/ *noun*
1 پرخەرجی، زۆرتێچوویی، خەرجهەڵگری، زۆربڕ 2 بەبایەخی، بەنرخبوون، گرانبایی‌بوون ◌ 1 پرهزینگی 2 ارزش‌مندی، گران‌قیمتی

**costly** /ˈkɒstli, US ˈkɔːst-/ *adjective* (costlier, costliest)
گران، زۆربایی، زۆربڕ، خەرجهەڵگر، پرمەزاخ، پرخەرج، زۆری تێدەچێ: *a* ◊ *costly gems* ◌ *costly mistake* گران، پرهزینه

**costmary** /ˈkɒstmɛːri/ *noun*, *pl.* costmaries
گوڵەهەنگوین؟، زرودزەرد؟: گیایێکی بۆنخۆش لە تیرەی daisy، زووتر بۆ مەبەستی پزشکی بەکاردێترا [*Balsamita major*] ◌ نوعی گیاه

**cost of living** *noun*
خەرجوباری ژیان، پێبژێوی ژیان ◌ هزینه‌ی زندگی

**cost of living index** = retail price index

**cost price** *noun*
نرخ یان بایی براوە، نرخی بنەڕەتی ◌ قیمت تمام‌شده

**costs** *noun, pl.*
تێچوون یان خەرجی پارێزەر، پارێزەرانە ◌ هزینه‌ی وکیل

**costume** /ˈkɒstjuːm, US ˈkɑːstuːm/ *noun*
1 جلوبەرگ، کنج، شمەک، کوت و تەنوورە، کوت و داوێن 2 جلی خۆماڵی یان خۆجێیی 3 جلوبەرگی تایبەتی ◌ 1 لباس، کت و دامن 2 لباس محلی 3 لباس مخصوص

**costumed** /ˈkɒstjuːmd, US ˈkɑːstuːmd/ *adjective*
بەرگلەبەرکردوو، بەرگپۆش، بەرگپۆشیو، کوتوداوێنلەبەرکردوو ◌ لباس‌پوشیده، کت و دامن‌پوشیده

**costume drama** *noun*
کۆستیوم دراما (شانۆ، فیلم و هتد بە جلوبەرگی مێژوویییەوە) ◌ درامای کوستوم

**costume jewellery** *noun*
گەوهەرە دەسکردەکان، گەوهەری دەسکرد و چروک، گەوهەرە کەمنرخ یان قەڵبەکان ◌ جواهرات تقلبی

**costume piece** *noun*
شانۆی مێژوویی (جلوبەرگی مێژوویی لەبەرکراو) ◌ نمایش تاریخی

**costume play** *noun*
شانۆی مێژوویی ◌ نمایش تاریخی

**costumier** /kɒsˈtjuːmiə(r), US kɑːsˈtuːmieɪ/ *noun*, also -mer /-mə/
کەسێ کە جلی تایبەتی بۆ شانۆ و بۆنەی تر دروست یان ئامادە دەکا، فرۆشیاری جلی تایبەتی، بەرگدروو ◌ کوستومیر، خیاط

**cosy** /ˈkəʊzi, US ˈkoʊzi/ *adjective* (cosier, cosiest), *noun*
1 *adj* (هەروەها cozy)ئاسوودە، تایبەتی، گەرم، خۆش: *a cosy little room* 2 دۆستانە، خۆمانە *n* (*pl.* cosies) سەرقۆری، رووقۆری (کورتەی cosily /ˈkəʊzɪli, US ˈkoʊzɪli/ :tea cosy *adv*: بە ئاسوودەیی، ئاسوودە، تەخت؛ cosiness /ˈkəʊzinəs, US ˈkoʊzinəs/ *n*: ئاسوودەیی) ◌ 1 *adj* راحت 2 دوستانه، خصوصی *n* روقوری

**cot**[1] /kɒt, US kɑːt/ *noun*, also US crib
1 تەخت(خەو)ی منداڵ 2 کۆلیت، کۆختە ◌ 1 تخت‌خواب بچه 2 کلبه

**cot**[2] *abbreviation* cotangent

**cotangent** /kəʊˈtændʒ(ə)nt/ *noun*
(بیرکاری) کۆتانژانت، کوتانژانت ◌ کتانژانت

**cot death** *noun*
مەرگەخەوی منداڵ، خەوەمەرگینە ◌ خواب‌مرگی کودک

**cote** /kəʊt/ *noun*
1 کولانـه، قن، کوریـت، هێلانـه، هـێلین، یـاگۆ، ئاغـەڵ، سـەرگێر 2 کۆلیت، کۆختـە 3 کۆترخـان ۞ 1 لانه، مرغدان، آغل 2 کلبه 3 کبوترخان

**co-tenancy** /kəʊ'tenənsl/ *noun*, also co-tenure /kəʊ'tenjə(r)/
کرێنشینی هاوبەشی، هاوکرێنشینی ۞ استیجار اشتراکی

**co-tenant** /ˌkəʊ'tenənst/ *noun*
کرێنشینی هاوبەش، هاوکرێنشین ۞ مستأجر مشترک

**coterie** /'kəʊtəri, US 'koʊ-/ *noun, pl.* coteries
کۆڕ، دەستە، تاقم، هاوڕیبازان، ئالقە: *a literary coterie* ۞ جرگه، محفل

**coterminous** /kəʊ'tɜ:mɪnəs, US koʊ'tɜ:rm-/ *adjective*, also -rminal
هاوسنوور، هەڤتخوب، هاوکەوشەن، هاوبەستە، نزیک، تەنیشتبەتەنیشت: *a voting district coterminous with the city* (-nously /kəʊ'tɜ:mɪnəsli, US koʊ'tɜ:rm-/ *adv*) ۞ همرز، مجاور

**cotillion** /kə'tɪljən/ *noun*, also cotillon
کۆتیلۆن: 1 جۆرێ هەڵپەڕکێ و سەمای کرژی فەرەنسی سەدەی هەژدەیەم 2 (لە ئەمریکا) quadrille ۞ کوتیلون

**cotinga** /kə'tɪŋgə/ *noun*
جۆرێ باڵندە کە لە دارستانەکانی ئەمریکای ناوەندی و باشووریدا دەبینرێ [*Cotinga* و توخمەکانی تر: گەڵێ جۆرن] ۞ نوعی پرنده

**cotoneaster** /kəˌtəʊnɪ'æstə/ *noun*
دارناسن، شیرخشت (دەوەنێ گەلاورد لە تیرەی rose [توخم *Cotoneaster*]) ۞ شیرخشت

**Cotswold** /'kɒtswəʊld/ *noun*
رەگەزێکی مەڕ کە خورییەکی باشی هەیە (بنەڕەت: لە گردەکانی *Cotswold* لە ناوەندی ئینگلتەرە) ۞ کوتس‌ولد

**cotta** /'kɒtə/ *noun*
جۆرێ جلی کورت شێوەی surplice دەدا، قەشەکانی کاتۆلیک لەبەری دەکەن (لە ئیتالیایی، پێوەندی بە coat ـەوە هەیە) ۞ کوتا

**cottage** /'kɒtɪdʒ, US 'kɑ:t-/ *noun*
قۆختە، کۆختە، کاز، خانوچکە، خانووی هاوینەهەواری ۞ کلبه، ویلا

**cottage cheese** *noun*, also Dutch cheese, pot cheese, smearcase
لۆرک، پەنیری کاتاژ ۞ پنیر کاتاژ

**cottage hospital** *noun*
نەخۆشخانەی دێ یا گوند (چکۆلە) ۞ بهداری

**cottage industry** *noun*
پیشەسازی نیومال، کارگای نیومال ۞ کارگاه خانگی

**cottage loaf** *noun*
(بریتانیا) کولێرە، نانەخرە ۞ نان گرد

**cottage pie** = shepherd pie

**cottage tulip** *noun*
جۆرێ هەلالەی درێژی دەرەنگ‌پشکوتوو ۞ نوعی لاله

**cottager** /'kɒtɪdʒə(r), US 'kɑ:t-/ *noun*
کۆختەنشین، دێنشین، کازنشین ۞ ساکن کلبه

**cottar** /'kɒtə/ *noun*, also cottar
(لە سکاتلەند و ئیرلەند) کۆختەنشین، دێنشین، کشتکار، جووتیار، وەرزێر، رەعیەت، مسکین ۞ کلبه‌نشین، کشاورز، رعیت

**cotter-pin** /'kɒtə pɪn, US 'kɑ:tər/ *noun*
(ئەندازیاری) ئێشپیل، بزماری پەرچدراو ۞ اشپیل

**cottier** /'kɒtɪə/ *noun*
1 (کۆن و لە بریتانیا) کرێکاری لادێیی و کۆختەنشین 2 (ئیرلەند) کرێنشینی کۆختە ۞ کوتیر

**cotton** /'kɒtn, US 'kɑ:tn/ *noun, adjective*
*n* 1 لۆکە، پەموو 2 (هەروەها cotton plant) گیالۆکە، رووەکی پەموو، ورە، گیاپەموو [توخم *Gossypium*] 3 دەزوو، هەودا 4 چیت، تەژگ، پارچە یان بەرگی کەتانی، کوتاڵی کەتانی، جاو، پەمەیی *adj* کەتانی، لۆکەیی، پەموویی (بنەڕەت: لە *kuṭn* ی عەرەبییەوە) ۞ *n* 1 پنبه 2 گیاه پنبه 3 نخ 4 لباس یا پارچه‌ی نخی *adj* نخی، پنبه‌ای

**cotton batting** = cotton wool

**cotton-beating** *noun*
پەمەلان، کێڵگەی پەموو، لۆکەلان، پەمەزار ۞ پنبه‌زار

**cotton bud** *noun*, also (Q-Tip)
گوێسڕە، گوێسڕ ۞ گوش‌پاک‌کن

**cotton-cake** *noun*
(تلتە)پەموانە (وەکوو تفاق بۆ مەڕومالات) ۞ کنجاره‌ی پنبه‌دانه

**cotton candy** = candy floss

**cotton cloth** *noun*
خام، جاو، هوومایی، پارچەی کەتانی، پەمەیی، چیت، تەژگ ۞ پارچه‌ی نخی

**cotton factory** *noun*, also cotton mill
کارگە یان کارخانەی لۆکەڕیسی ۞ کارخانه‌ی نخ‌ریسی

**cotton farm** *noun*
پەمەلان، کێڵگەی پەموو، لۆکەلان، پەمەزار، پەمەجار ۞ پنبه‌زار

**cotton gin** *noun*
جیکەنە، جیکەنە، دوکەک، لۆکەشێکەنە ۞ ماشین پنبه‌پاک‌کنی

**cotton grass** *noun*
جۆرێ sedge [توخم *Eriophorum*] ۞ نوعی

گیاه

**cotton lavender** *noun*
رووەکێکی دەوەنئاسای بۆنخۆشی چکۆلە لە تیرەی چاوپشیلە daisy [تۆخم *Santolina*: چەندین جۆرن] ◌ نوعی گیاه

**cotton-mouth** *noun*, also cotton-mouth moccasin
مارێکی گەورەی پرمەترسی باشووری رۆژهەلاتی ئەمریکا [*Agkistrodon piscivorus*] ◌ نوعی افعی چالدار

**cotton-pod** *noun*
قۆزاخەی پەموو، سارمە، قلیف ◌ غوزەی پنبه

**cotton-reel** *noun*
تەختەکنگر، تەختەکندر ◌ کتانریل

**cottonseed** *noun*
تۆوی لۆکە، پەمووانە، پەموودانە، پەمیدانک ◌ پنبەدانه

**cottonseed oil** *noun*
رۆنی پەمووانە ◌ روغن دانه

**cotton-spinner** *noun*
1 لۆکەریس 2 (cotton spinner) لۆکەریسە: خەیارێکی رەشی دەریایی زەریا تەنکاوەکان [*Holothuria forskali*] ◌ 1 پنبەریس 2 نوعی خیار

**cotton-spinning** *noun*
لۆکەریسی ◌ پنبەریسی

**cotton stainer** *noun*
جۆری bugی ئەمریکای باکووری کە لەسەر قۆزاخەی لۆکە دەنیشێ و دەبێتەهۆی پەڵەیەکی مەیلەوسوور [*Dysdercus suturellus* و جۆرە پێوەندیدارەکان] ◌ کتان استینر

**cotton swab** *noun*
(ئەمریکا) شکۆفە یا خونچەی لۆکە ◌ غنچەی پنبه

**cottontail** *noun*
کەروێشکی کلکلۆکەیی [تۆخم *Sylvilagus*] ◌ خرگوش دمپنبەای

**cotton-thistle** *noun*, also scotch thistle or spear thsitle
(رووەکناسی) کەرتەشی ◌ خار پیرزن، خارپنبه

**cottonweed** *noun*
(رووەکناسی) رووەکێکی بۆنخۆشی گوڵزەرد، لە تیرەی daisy [*Otanthus maritimus*] ◌ کوتونوید

**cottonwood** /'kɒtnwʊd, US 'kɑ:tn-/ *noun*, also cottonwood tree
1 دارلۆکە، دارپەموو (جۆرێ دار چناری ئەمریکای باکووری لەگەڵ بەر و دەنکەکەی [*Populus deltoids* و جۆرەکانی تر]) 2 جۆرێ دەوەنی ئەوسترالیایی [*Pomaderris phylicifolia* (ێ buckthorn) و *Bedfordia salicina* (خێزانی daisy)] ◌ کتانوود

**cotton wool** *noun*
لۆکەی برین یان پزشکی، لۆکەی خاو ◌ پنبەی بهداشتی

**cottony** /'kɒtnɪ/ *adjective*
پەمەیی، لۆکەیی، کەتانی، شێوەپەموو، نەرم، soft ◌ پنبەای، نرم

**cottony-cushion scale** *noun*
جۆرێ مێرووی پوولەکەرێزی ئەوسترالیایی، دەداتە infesting دارە تیرەپرتەقاڵییەکان و گزوگیا [*Icerya purchasi*] ◌ نوعی حشره

**cotyl-, cotyli-, cotylo-** *suffix*
پێشگر: پیاڵە، قاپ، شێوەپیاڵە، پیاڵەیی: *cotyloid* ◌ پیشوند: فنجان، حقه

**-cotyl** *suffix*
پاشگر: پەڵ cotyledon: *hypocotyl* ◌ پسوند: لپه

**cotyledon** /ˌkɒtɪ'li:d(ə)n/ *noun*
1 (رووەکناسی) پەڵ، گەڵادان 2 گیایێکی شیلەدار لە تیرەی stonecrop [تۆخم *Cotyledon* (adj cotyledonal) بنەڕەت: لە لاتینەوە "navelwort"، لە یۆنانییەوە *kotulēdōn* "بۆشایی یان چاڵی پیاڵەئاسا cup-shaped cavity"] ◌ 1 لپه 2 نوعی گیاه

**cotyledonary** *adjective*
پەڵپەڵ، خاوەنی گەڵادان، پەڵاوی، پەڵی ◌ دارای لپه

**cotyledonous** /ˌkɒtɪ'li:dənəs/ *adjective*
پەڵاوی، پەڵدار، پەڵی، پەڵپەڵ ◌ دارای لپه

**cotyloid** *adjective*
(تونیکاری)پیاڵەئاسا، پیاڵەیی، قاپیلکی، cup-shaped ◌ فنجانیشکل

**cotylosaur** *noun*
پیاڵە(مار)مێلکە، کۆتیلۆسۆر: هەر خشۆکێکی کەتەی دەستەی (Cotylosauria) کە بە درێژایی قۆناخی Pennsylvanian (کاربۆنیفێر بەرەو تریاسیک) پەیدا بوون و سەرەچەلەکی هەموو خشۆکەکانی ترن (cotylosaurian *adj*) ◌ کوتیلوسور

**cotype** *noun*
(پۆلاندنی گیانەوەر و گیا) جۆری لاوەکی، لاجۆر ◌ گونەی فرعی

**coucal** /'ku:k(ə)l, US 'kʊkɑ:l/ *noun*
پەپووجورە(کلاونە)؟: باڵندەیێکی ناحەزی زلەی عەرزی، لە تیرەی cuckoo [تۆخمەکانی *Centropus* و *Coua*: گەلێ جۆرن] ◌ کوکال

**couch**[1] /kaʊtʃ/ *noun*
1 قەنەفە، کەنەپە 2 تەخت (هی تێڕوانینی پزشکی) ◌ 1 کاناپه 2 تخت

**couch**[2] /kaʊtʃ/ *noun*, also couch grass
(رووەکناسی) چیمەن، هەرێز، فرێزوو، وەنەور [*Elymus repens* و جۆرەکانی تر] ◌ مرغ

**couchant** /'kaʊtʃ(ə)nt/ *adjective*
(heraldry، گیانەوەران) راکشاو، پاڵکەوتوو (لەسەر پێ و سەریان بەرز راگرتووە) ۞ لمیده
**couchette** /ku:'ʃet/ *noun*
(فەرەنسی) تەختی قەدکراو (تووشتاو، شەمەندەفەر) ۞ تخت‌تاشو
**couch potato** *noun*
خۆرەی تەلەفزیۆن، هەمیشە بەرتەلەفزیۆن‌گرتوو، هەمیشە لەبەر تەلەفزیۆن‌دانیشتوو ۞ میخ تلویزیون
**cougar** /'ku:gə(r)/, *pl.* -rs or cougar = puma
**cough** /kɒf, US kɔ:f/ *noun*
کۆخە، قۆخە، کۆکە، سنگێشە ۞ سرفه، سینه‌درد
**cough drop** *noun*
حەبی مژین (بۆ سنگ و نەرم‌کردنی کۆخە) ۞ قرص مکیدنی
**cough mixture** *noun*, also cough medicines or cough syrup
گیراوەی کۆخە، شەربەتی کۆخە ۞ شربت سینه
**coughing** *noun*
کۆخین، قۆخین، کۆکین ۞ عمل سرفه کردن
**could** /kəd, US kʊd/ = past of can
**couldn't** = coluld not (past of can)
**coulee** /'ku:li/ *noun*
درکەندی قووڵ، کەندالی قووڵ، ئاودڕی قووڵ، جۆگەی وشک ۞ فرکند عمیق، جوی خشک
**coulibiac** /ˌku:lɪ'bjak/ *noun*, also koulibiac
پای گۆشت یان ماسی رووسی (بنەڕەت: لە kulebyaka رووسی) ۞ کولیباک
**coulisse** /ku:'li:s/ *noun*
1 (فەرەنسی، لە وێنەکێشیدا) نەخش یان ریک‌خستنی دووباڵی (the coulisse) 2 باڵەکان، پەلەکان ۞ 1 آرایش دوجناحی 2 بال‌ها
**couloir** /'ku:lwɑ:/ *noun*
تەنگەدۆڵ، دەربەند، کەندەڵان (فەرەنسی "corridor ،gully") ۞ کولویر
**coulomb** /'ku:lɒm, US -lɑ:m, -lɔ:m/ *noun, abbreviation* C
کولام، کۆلۆن (یەکەی جیهانی پێوانی بڕی کارەبا؛ بنەڕەت: لە ناوی ئەندازیاری سپایی فەرەنسی Charles-Augustin de Coulomb) ۞ کولام
**Coulomb's law** /'ku:lɒmz/ *noun*
(فیزیک) قانوونی کۆلۆمب یان کۆلۆن ۞ قانون کولومب
**coulter** /'kəʊltə/ *noun*, US colter
کولتێر، تیغەی پێشەوەی ئاموور، تیغە ۞ کولتر
**coumarin** /'ku:mərɪn/ *noun*
کومارین: ئاوێتەیێکی ئەندامی $C_9H_6O_2$ کە بۆ سازکردنی گوڵاو بەکاردێت، لە زۆربەی گیاکاندا هەیە ۞ کومارین
**coumarone** /'ku:mərəʊn/ *noun*
کوماروّن: ئاوێتەیێ بۆ سازاندنی قەرنیش و جەوهەری چاپ ۞ کومارون
**council** /'kaʊnsl/ *noun*
1 ئەنجومەن، جڤات، دیوان، راوێژگە، کۆبوونەوە، جڤین، کۆمبین 2 کۆڕی کڵێسەیی 3 دەستەی راوێژکاران 4 لقێکی خۆجێیی لە رێکخراوەیێ 5 کۆمەڵە (بنەڕەت: لە concilium لاتین "assembly ،convocation") ۞ 1 شورا، انجمن، جلسه 2 مجمع کلیسایی 3 مجلس شورا 4 شاخه‌ای محلی از سازمانی 5 جمعیت
**council-chamber** *noun*
ژووری ئەنجومەن، دیوی ئەنجومەن ۞ اتاق شورا
**council estate** *noun*
کۆ(مەڵە)خانووی ئەنجومەن (بە دەستی ئەنجومەنی خۆجێیی دروس کراوە) ۞ مجتمع سازمانی
**council flat** *noun*
ماڵ یان دەستەخانووی ئەنجومەن ۞ خانە یا آپارتمان سازمانی
**Council for Mutual Economic Assistance** = COMECON
**council house** *noun*
ماڵ، خانوو یان دەستەخانووی ئەنجومەن ۞ خانه یا آپارتمان سازمانی
**councillor** /'kaʊnsələ(r)/ *noun*, also councilor or councilman /'kaʊnslmən/ *pl.* councilmen
ئەندامی ئەنجومەن ۞ عضو شورا
**councillorship** *noun*
ئەندامێتی ئەنجومەن ۞ عضویت شورا
**Council of Europe** *noun*
ئەنجومەن یان جڤاتی ئەورووپا ۞ شورای اروپا
**council of ministers** *noun, pl.*
ئەنجومەنی وەزیران یا شالیاران ۞ هیأت وزیران
**council of war** *noun*
ئەنجومەنی شەڕ، کۆبوونەوەی ئەفسەرانی شەڕ لە کاتی شەڕدا؛ کۆبوونەوەی تەنگەتاوی ۞ شورای جنگ؛ میتینگ اضطراری
**council tax** *noun*
ئەنجومەنانە، باجی دراو بە حکومەتی خۆجێیی (لەسەر بنچینەی نرخ و بایەخی مەزندەکراوی دارایی) ۞ مالیات پرداخت‌شده به دولت محلی
**councilwoman** /'kaʊnslwʊmən/ *noun, pl.* councilwomen
ئەندامی ئەنجومەن ۞ عضو انجمن
**counsel** /'kaʊnsl/ *noun*
1 راوێژ، شیرەت، شێور، ئامۆژگاری، نەسیحەت، پرس‌وڕا 2 راسپاردن 3 رێنوێنی 4 پێشنیاز 5 پاریزەر، ئاوکات، بەرەڤانکار، دەستەی پارێزەران ۞ 1 اندرز، پند، مشورت 2 توصیه 3 رهنمود 4 پیشنهاد 5 وکیل، وکلا

**counseling** /'kaʊnsəlɪŋ/ *noun, adjective*
*marriage guidance -nselling* : راوێژکاری *n* راوێژکاری‌یانه *adj* ۞ مشاوره *n* مشاوره‌ای *adj*

**counsellor** /'kaʊnsələ(r)/ *noun*, also counselor
1 راوێژکار، راوێژگەر، شیرەتقان، شێورمەند 2 پارێزەر 3 مافزان، مافەوان ۞ 1 مشاور 2 وکیل دادگستری 3 حقوق‌دان

**count**[1] /kaʊnt/ *noun*
1 ژماردن، هێژمارتن، حساب‌کردن، ژمارە، رەنووس، حساب، حسێب 2 کێشە، دۆز 3 بابەت، برگە، بابەتی تاوانباری 4 لایەن، ئالی، لا، بوار ۞ 1 شمارش، رقم، شماره، حساب 2 قضیه 3 مورد، مورد اتهام 4 جنبه، نظر

**count**[2] /kaʊnt/ *noun*
کۆنت (سەرنێویکە لە فەرەنسە، ئیتالیا و هتد، بەرامبەر بە پایەی earl بریتانی؛ *countship n*) ۞ کنت

**countable** /'kaʊntəbl/ *adjective*
*a countable set* : بژمێر، لەژماردن‌هاتوو (countably *adv* ؛countability *n*) ۞ قابل شمارش، شمردنی

**countable noun** *noun*
(ڕێزمان) ناوی بژمێر یان لەژماردن‌هاتوو ۞ اسم شمردنی

**countdown** /'kaʊntdaʊn/ *noun*
داژماردن، پەرچەژمارە ۞ شمارش معکوس

**countenance** /'kaʊntənəns/ *noun*
1 بیچم، روو، روخسار، دەم‌وچاو 2 پەسندکردن 3 داکۆکی، پشتیوانی، پشتگیری 4 ورەپێدان، هاندان ۞ 1 سیما، چهره 2 تأیید 3 حمایت 4 تشویق

**counter**[1] /'kaʊntə(r)/ *noun*, = worktop
1 ژێتۆن، پوول، مۆرە، زار (یاری)، دیسک (چکۆلە)، پەپکیلە 2 (لە لێکدانا) ـژمێر، ـپێو ۞ 1 ژتون 2 ـشمار، ـسنج

**counter**[2] /'kaʊntə(r)/ *adverb*, counter to
(بە) دژی، (بە) پێچەوانەی ۞ مغایر، (بر) ضد، برخلاف

**counter**[3] /'kaʊntə(r)/ *noun*
1 پش(ت)پاژنە، بەشی پشتەوەی کەوش و پێلاو 2 سنگی تەسپ 3 پاژنە یان کنگی کەشتی کە لە سەرووی ئاوەوەیە 4 بەرمیز، بەردەم، پێش‌خوان 5 دژەلێدان، زەربە یان لێدانی بەرامبەر، لێدانەوە، پەرچەزەربە، پەرچەلێدان ۞ 1، 2 و 3 کونتر 4 باجە، گیشە 5 ضربەی متقابل

**counter-** /'kaʊntə(r)/ *prefix*
پێشگر: دژ، پەرچە (بنەڕەت: لە *contra* لاتین "against") ۞ پیشوند: ضد، پاد

**counteraction** /ˌkaʊntə'rækʃn/ *noun*
1 پەرچەکردار، دژکردەوە 2 بەرەنگاری، بەرەنگاربوونەوە، بەربەرەکانی 3 پووچ‌کردن، لەکارخستن، ساردکردنەوە، کاریگەری نەهێشتن، پووچەڵ‌کردنەوە ۞ 1 عمل متقابل 2 تقابل 3 خنثی‌سازی

**counteractive** /ˌkaʊntə'ræktɪv/ *adjective*
دژ، پووچەڵکەرەوە، لەکارخەر ۞ مخالف، خنثی‌ساز

**counterattack** /ˌkaʊntə ətæk/ *noun*
دژەهێرش، پەرچەهێرش، هێرش‌دانەوە ۞ پاتک

**counter-attraction** *noun*
پەرچەڕاکێشان، دژەڕاکێشان، ڕاکێشانی بەرامبەر، ڕاکێشانەوە ۞ کشش متقابل، جاذبەی متقابل

**counterbalance** /'kaʊntəbæləns, US 'kaʊntərb-/ *noun*
1 پارسەنگ، هۆکاری هاوسەنگی یان هاوکێشی، هاوسەنگە 2 هاوسەنگی، هاوکێشی ۞ 1 وزنەی تعادل، عامل توازن 2 موازنه

**counterblast** /'kaʊntəblɑ:st, US 'kaʊntərblæst/ *noun*
وەلامی توند ۞ جواب دندان‌شکن

**counterblow** *noun*
لێدانەوە، دژەلێدان، پەرچەزەربە ۞ ضربەی متقابل

**counter ceiling** *noun*
میچ‌ناسا، سامیچ، میچەدرۆزنە؟ ۞ سقف کاذب

**countercharge** /'kaʊntətʃɑ:dʒ/ *noun*
پەرچەتۆمەت، تۆمەت‌دانەوە، بوختانی بەرامبەر ۞ تهمت متقابل

**counterclaim** /'kaʊntəkleɪm, US -tərk-/ *noun*
پەرچەداواکاری، دژەداواکاری، دژەوابێژی ۞ ادعای متقابل

**counterclockwise** /ˌkaʊntə'klɒkwaɪz, US -tər'klɑ:k-/ *adverb*
بە پێچەوانەی سووڕانی میلەکانی کات‌ژمێر، چەپ‌سوور ۞ خلاف جهت عقربه‌های ساعت

**counterculture** /'kaʊntəkʌltʃə(r), US -tərk-/ *noun*
دژەچاند، پەرچەکولتوور، دژەفەرهەنگ، دژەکولتوور ۞ ضدفرهنگ

**countercurrent** *noun*
پەرچەتەوژم، دژەتەزوو، دژەڕۆیین، تەوژمی پێچەوانە ۞ جریان متقابل

**counter-espionage** *noun*
دژەسیخوڕی ۞ ضد جاسوسی

**counter example** *noun*
دژەنموونە، نموونەی دژ، پەرچەنموونە ۞ مثال نقض، مثال خلاف

**counterfeit** /'kaʊntəfɪt, US -tərf-/ *adjective, noun*
1 قەلب، ساختە، درۆزنە، چروک، فرت‌وفێلاوی، زڕک 2 هەڵبەستن، ساختەکاری، گزی،

فرتوفێڵ، فروفێڵ ۞ 1 جعلی، تقلبی 2 جعل

**counterfeiter** /'kaʊntəfɪtə(r), US -tərf-/ *noun*

قەڵبەچی، ساختەکار، ساختەچی، بەفروفێڵ، راستیگۆڕ ۞ جاعل

**counterfeiting** *noun*

ساختەکاری، فرتوفێڵ، فروفێڵ، راستیگۆڕی ۞ جعل

**counterfoil** /'kaʊntəfɔɪl, US -tərfɔɪl-/ *noun*

(زۆرتر لە بریتانیا) بنەچەک، کنگەچەک، بنک، بنەقەبز، stub ۞ تەچک، تەرسید

**counter form** *noun*

دژەشێوە، دژی فۆرم، پەرچەشێوە ۞ ضد صورت

**counter force** *noun*

پەرچەهێز، دژەهێز، هێزی بەرامبەر ۞ نیروی متقابل

**counterinsurgency** *noun*

دژەسەرهەڵدان ۞ ضد شورش

**counter-intelligence** *noun*

دژەهەواڵگری ۞ ضد اطلاعات

**counter-intuitive** *noun*

رێتێنەچوو، پێچەوانەی ناوەز، ناژیرانە، لەعەقڵبەدوور ۞ برخلاف عقل، نامعقول

**counterirritant** *noun*

کەونتێرنیریتانت ۞ محرک ضد تحریک

**counter logical** *noun*

دژی لۆژیک، دژەلۆژیک ۞ ضد منطق

**countermand** /ˌkaʊntə'mɑːnd/ *noun*

هەڵوەشاندنەوە، بەتاڵکردنەوە، پووچەڵکردنەوە، شکاندن ۞ نسخ، ابطال

**countermarch** /'kaʊntəmɑːtʃ/ *noun*

1 گەڕانەوە، زڤرین 2 گۆڕانی رەوت یان شێوە 3 گۆڕانی لایەنی جووڵاندنی ئەرتەش یان سپا ۞ 1 برگشت 2 تغییر روش 3 کونترمارچ

**countermeasures** /'kaʊntəmeʒə(r), US -tərm-/ *noun*

نەهێشتن، دژەجێبەجێکردن، پەرچەکردار ۞ اقدامات متقابل

**countermine** /'kaʊntəmaɪn/ *noun*

1 رەهۆڵی بن رەهۆڵ 2 دژەپیلان ۞ 1 کونترمین 2 توطئەی متقابل

**countermovement** *noun*

دژەبزووتنەوە، پەرچەجووڵانەوە ۞ ضد جنبش

**countermove** *noun*

دژەبزاوت، پەرچەجووڵە، دژەجووڵە، دژەجووڵانەوە ۞ ضد حرکت

**countermure** /'kaʊntəmjuː(r)/ *noun*

دیواری پشتیوان، بەرەیلاخ، لاهێزە ۞ دیوار پشتیبان

**counternature** *noun*

دژەسروشت، پەرچەخۆڕسک، دژەخۆڕسک ۞ ضد طبیعت

**counteroffensive** /'kaʊntərəfensɪv/ *noun*

دژەهێرش، پەرچەهێرش ۞ پاتک

**counterpane** /'kaʊntəpeɪn, US -tərp-/ = bedspread

**counterpart** /'kaʊntəpɑːt, US -tərpɑːrt/ *noun*

هاوتا، چوون، روونووس، دەق، وێنە، وەکوویەک، وەکیەک، هاوشێوە، هاوتا، هاوجووت، لێکچوو، duplicate؛ complement ۞ نسخە، المثنی، نظیر، مشابە، همانند

**counterplot** /'kaʊntəplɒt/ *noun*

دژەپیلان، پەرچەپیلان، پیلانبەزێنی، پیلانشکێنی ۞ ضد توطئە

**counterpoint** /'kaʊntəpɔɪnt, US -tərp-/ *noun*

1 هونەری تێکەڵکردنی ئاوازەکان، هاوئاوازی، (موسیقا) پۆلیفۆنی 2 خاڵی بەرامبەر، دژبەر ۞ 1 کنترپوان 2 نکتەی مقابل

**counterpoise** /'kaʊntəpɔɪz/ *noun*

هاوکێشی، هاوسەنگی، هاولەنگەری، پارسەنگ ۞ توازن، عامل تعادل

**counterproductive** /ˌkaʊntəprə'dʌktɪv, US -tərp-/ *adjective*

دژەبەرهەمهێن، زیانپێگەیێن، بەکاریگەری پێچەوانە یان خراپەوە: *Increases in taxation would be counterproductive* ۞ دارای نتیجەی معکوس

**counterproductively** /ˌkaʊntəprə'dʌktɪvli, US -tərp-/ *adjective*

دژەبەرهەمهێنەرانە ۞ بە طور دارای نتیجەی معکوس

**counterproductiveness** /ˌkaʊntəprə'dʌktɪvnəs, US -tərp-/ *noun*

هەبوونی کاریگەری پێچەوانە یان خراپ ۞ نتیجەی معکوس داشتن

**counterpropaganda** *noun*

پەرچەبانگەشە، دژەبانگەشە، بانگەشەدانەوە ۞ تبلیغات متقابل

**counterproposal** *noun*

دژەپێشنیاز، پەرچەپێشنیاز، پێشنیازدانەوە ۞ پیشنهاد متقابل

**counterproposition** *noun*

دژەپرۆپۆزیشن، پەرچەپرۆپۆزیشن ۞ پادگزارە

**counterpunch** = counterblow

**counterreferendum** *noun*

دژەچاکسازی، پەرچەچاکسازی ۞ ضد اصلاح

**Counter-Reformation** *noun*

1 چاکسازی کلێسەی رۆم لە سەدەکانی 16 و 17 دا کە ئەویش لە ئەنجامی چاکسازی

پرۆتێستانەکاندا کرا 2 (counter-reformation)
بەرچەچاکسازی، دژەچاکسازی ◌ 1
کونتررفومیشن 2 اصلاحات متقابل

**counter-revolution** *noun*
دژەوەرگۆڕان، دژەشۆڕش، پەرچەگۆڕانە ◌ ضد انقلاب

**counterrevolutionary** *adjective, noun*
سەربە دژەوەرگۆڕان یان دژەشۆڕش، دژەشۆڕشی، مرۆی دژەوەرگۆڕان یان دژەشۆڕش ◌ ضد انقلابی، آدم ضد انقلاب

**counterrotation** *noun*
دژەوەرسووڕان، پەرچەسووڕانەوە، دژەخولانەوە، سووڕانی پێچەوانە ◌ دوران یا چرخش متقابل

**countersank** = past of countersink

**counterscarp** /ˈkaʊntəskɑːp/ *noun*
دیواری دەرەوەی خەندەکی شوورە fortification ◌ کونتراسکارپ

**countersign** /ˈkaʊntəsaɪn/ *noun*
1 مۆرسەلماندن، باوەڕپێدان بە ئیمزا، ئیمزای دووەم 2 وشەی نهێنی، وشەی تێپەڕین ◌ 1 تصدیق امضا 2 اسم شب

**counterstroke** *noun*
دژەلێدان، زەربەگێڕەوە ◌ ضد ضربه

**countersunk** = past and past participle of countersink

**countertendency** *noun*
دژەتێندێنسی ◌ ضد گرایش

**countertenor** *noun*
(موسیقا) 1 کەونتێرتینۆر (بەرزترین دەنگی بالقی گۆرانیبێژی پیاو) 2 پارچە موسیقایێکی کەونتێرتینۆر ◌ 1 کنترتنور 2 قطعەی کنترتنور

**counterterrorism** /ˌkaʊntəˈterərɪzəm/ *noun*, also counter-terrorism
دژەترسکاری، پەرچەترۆریزم، دژەترۆریزم، دژەترۆرکاری، کەونتێرترۆریزم ◌ کنترتروریسم

**counterterrorist** /ˌkaʊntəˈterərɪst/ *noun*, also counter-terrorist
دژەترسکار، پەرچەترۆریست، دژەترۆریست، کەونتێرترۆریست، دژەترۆرکار: *There were gaps in their -st strategy* ◌ کنترتروریست

**countertop** = worktop

**countervailing** /ˈkaʊntəveɪlɪŋ, US -tərv-/ *adjective*
قەرەبووکەرەوە، بۆبژێرەوە ◌ جبرانکننده

**counterweight** /ˈkaʊntəweɪt, US -tərw-/ = counterbalance

**countess** /ˈkaʊntəs, US -es/ *noun*
کەونتێس، ژنی کۆنت یان ئێرل (ژن) ◌ کنتس

**counting house** /ˈkaʊntɪŋ haʊs/ *noun*, also counting room
(مێژوویی) نووسینگە، ژمێرگە ◌ دفترخانه

**countless** /ˈkaʊntləs/ *adjective*
بێژمار، بێهەژمار، بێئەندازە، لەژمارەنەهاتوو، زۆر ◌ بیشمار، متعدد

**count noun** = countable noun

**countrified** /ˈkʌntrifaɪd/ *adjective*
دێهاتی، لادێیی، گوندی، دەشتەکی ◌ دهاتی، روستایی

**country** /ˈkʌntri/ *noun, adjective, pl.* -tries
*n* 1 وڵات، خاک 2 خەڵک، جەماوەر، گەل 3 نیشتمان، زێد 4 لادێ، گوند 5 دەرەوەی شار، دەشت، دەشتودەر 6 زێدوبووم، بووم، وڵات 7 دەستەی سوێندخۆران *adj* 1 لادێیی، گوندی، خۆجێیی 2 بێڕەوشت، بێماریفەت ◌ *n* 1 کشور 2 ملت، مردم 3 میهن، زادگاه 4 روستا 5 بیرون شهر 6 سرزمین 7 هیأت منصفه *adj* 1 روستایی، محلی 2 بیادب

**country and western** *noun*, (also C and W)
موسیقای لادێیی ◌ موسیقی محلی

**country bumpkin** *noun*
ساویلکە، دێهاتی، لادێیی ◌ دهاتی، سادەلوح

**country club** *noun*
یانە (ی وەرزشی) خۆجێیی ◌ باشگاه محلی

**country cousin** *noun*
مرۆی لادێیی یان حەپە ◌ آدم هالو

**country dance** *noun*
هەڵپەڕکێ یان سەمای لادێیی یان خۆجێیی، دەنسی خۆجێیی ◌ رقص محلی

**countrified** = countrified

**country house** *noun*
بەرواری، بەرروار، خانووبەرە، کۆشکوبەرە، کۆشک، خانووی دەوڵەمەندانە یان ئاغاواتی ◌ خانەی اربابی

**country life** *noun*
ژیانی لادێیی یان دێ ◌ زندگی روستایی

**countryman** /ˈkʌntrimən/ *noun, pl.* countrymen
1 لادێیی، دێنشین 2 هاووڵاتی، هاوولاتی ◌ 1 روستایی 2 هممیهن

**country music** *noun*
(لە ئەمریکا) موسیقای لادێیی ◌ موسیقی محلی

**country rock** *noun*
راکی لادێیی (تێکڵاوی راک و موسیقای لادێیی) ◌ کانتری راک

**country seat** *noun*
کۆشک، خانووی ئاغاواتی یان دەوڵەمەندانە ◌ خانەی اربابی

**countryside** /ˈkʌntrisaɪd/ *noun*
دەشودەر، دەوروبەری لادێ، دەرشار، دەرەشار، دەورەشار، کەوشان، زەوییەکانی دەوروبەری شار ◌ برونشهر، نواحی روستایی

**countrywide** /ˌkʌntriˈwaɪd/ *adverb,*

*adjective*
لــه ســەرتاســەری وڵاتدا، سەرتاســەری ◯ در سراسر کشور، سراسری
**countrywoman** /ˈkʌntriwʊmən/ *noun, pl.* countrywomen
1 ژنی لادێی 2 هاونیشتمانی ◯ 1 زن روستایی 2 هم‌میهن
**county** /ˈkaʊnti/ *noun, adjective, pl.* counties
*n* 1 (بریتانیا) ستان، پارێزگا، ئەیالەت 2 خەڵکی ستان 3 ناوچە، هەرێم، دەڤەر 4 (ئەمریکا) کەرتێکی بەڕێوەبەرایەتی administrative و سیاسی ئەیالەت یان هەرێمێ *adj* (نافەرمی، بریتانیا، وەک ئاوەڵناو، تایبەتی) چینی سەرەوەی کۆمەڵگا، گەورەزادەکان ◯ *n* 1 استان 2 مردم استان 3 ناحیه 4 بخش اداری یا سیاسی ایالتی *adj* (خاص) طبقه‌ی بالای مردم، اشراف
**county council** *noun*
ئەنجومەنی خۆجێیی یا ناوچەیی ◯ شورای محلی
**county councillor** *noun*
ئەندامی ئەنجومەنی خۆجێیی یان ناوچەیی ◯ عضو شورای محلی
**county court** *noun*
دادگای خۆجێیی ◯ دادگاه بخش
**countyman** *noun*
دیهاتی، لادێی، دیکانی ◯ دهاتی
**county-side** *noun*
دیهات ◯ کانتی‌ساید
**county town** *noun,* also county seat
ناوەندی هەرێم ◯ مرکز استان
**coup** /kuː/ *noun, pl.* coups /kuːz/
1 کودەتا، وەرگەڕان، to :coup d'état *an attempted coup ◊ stage/mount a coup* 2 گورزی *a failed/an abortive coup ◊* گورچکبڕ، لێدانی کاری، پەلاماری کوتوبڕ، گورزی یەکلایی‌کەرەوە 3 کردەوەی سەرکەوتووانە، سەرکەوتن 4 (بیلیارد) لێدانی تۆپ بۆ کونێ بێ‌ئەوەی لەوانی دی بکەوێ (بنەڕەت: فەرەنسی "stroke ،blow، مستەکۆڵە، زەبر به مشت") ◯ 1 کودتا 2 اقدام قاطع 3 اقدام موفقیت‌آمیز، موفقیت 4 کو
**coup de foudre** /ˌkuː də ˈfuːdr(ə), French ku də fudʀ/ *noun*
ڕووداوی پێشبینی‌نەکراو و کتوپڕ (ب.ت. خۆشەویستی لە یەکەم نیگادا) ◯ رخداد غیرمنتظره و ناگهانی
**coup de grace** /ˌkuː də ˈgrɑːs, French ku də gʀas/ *noun*
1 گوللە یا تیری دوایی 2 لێدان 3 کردەوە یان ڕووداوی یەکلایی‌کەرەوە، لێدانی گورچکبڕ ◯ 1 تیر خلاص 2 ضربه 3 اقدام یا رخداد نهایی
**coup de main** /ˌkuː də ˈmã, French ku də mɛ̃/ *noun*
هێرشی کوتوبڕ، پەلاماری ناکاو ◯ حمله‌ی ناگهانی
**coup d'état** /ˌkuː deɪˈtɑː, French ku deta/ *noun, pl.* coups d'état
وەرگەڕان، کودتا ◯ کودتا
**coup d'oeil** /kuː ˈdɜːɪ, French ku dœj/ *noun*
چاوپیاخشاندن، glance ◯ نگاه، نظر اجمالی
**coupé** /ˈkuːpeɪ, US kuːˈpeɪ/ *noun,* also coupe /kuːp/
1 ماشینی دوودرگا 2 (مێژوویی) عەرەبانەیێ carriage کی چوارچەرخ بۆ دوو سوار و لێخوڕێ 3 (قەتار) کوپە ◯ 1 اتومبیل کوپه 2 کالسکه‌ی چهارچرخه 3 کوپه
**couple** /ˈkʌpl/ *noun*
1 ژن‌ومێرد 2 دوودەزگیران، جووتەدەزووران 3 جووت، جووتەک، جفت، دوانە، دوودانە 4 چەند (دانە: *a -ple of days ago* : coupledom *n*) ◯ 1 زن و شوهر 2 دو نامزد 3 زوج، جفت 4 چند (تا)
**coupled column** *noun*
جووت‌ستوونە (بە مەودای نیوەی تیرەکەیان) ◯ ستون مضاعف
**coupler** *noun*
1 پێکەوەبەست، بەست 2 (عەرەبانە یا واگۆنی ڕێی ئاسن) قوڵی پێکەوەبەست ◯ 1 اتصالی 2 کوپلر
**couplet** /ˈkʌplət/ *noun*
دێڕەهەڵبەست، خشتە، دێرک، بەیت ◯ بیت
**coupling** /ˈkʌplɪŋ/ *noun*
1 پێکەوەبەستراوی، تێکهەڵکێشراوی، پێکەوەبەندی 2 جووتبوون، نزیکی، نیان: *illicit couplings* 3 چەفت، قوڵی پێک(ەوە)بەست، پێکبەست، بەست ◯ 1 اتصال 2 آمیزش جنسی 3 کوپلینگ
**coupon** /ˈkuːpɒn, US -pɑːn, ˈkjuː-/ *noun*
1 کۆپین، کوپۆن، بۆن، فۆرم 2 (سکاتلەند و ئیرلەند) دەم‌وچاو، ڕوخسار، بیچم، دیم ◯ 1 کوپن، بن، فرم 2 صورت
**courage** /ˈkʌrɪdʒ, US ˈkɜːr-/ *noun*
وێران، زەندەق، زات، دڵوجەرگ، چاوسووری، ئازایەتی (لە *corage* فەرەنسی کۆن، لە *cor* لاتین "دڵ") ◯ جرأت، شجاعت
**courageous** /kəˈreɪdʒəs/ *adjective*
چاوسوور، چاوقایم، زەندەقدار، دلێر، بوێر، ڕەشید، بەزات، نەترس، نەترسانە: *a very -ageous decision* ◯ شجاع، پرجرأت، جسورانه
**courageously** /kəˈreɪdʒəsli/ *adverb*
چاوسوورانە، نەترسانە ◯ جسورانه
**courageousness** /kəˈreɪdʒəsnəs/ *noun*
ئازایەتی، نەترسی، دلێری، بوێری ◯ شجاعت،

تیزڕەوکە: جۆری باڵندەی ئاسای plover تیزڕەو، هی ئاسیا و ئەفریکا [ Cursorius cursor (هی کریمیڕەنگ) و جۆرەکانی تر] ◊ نوعی پرنده

**coursing** /'kɔːsɪŋ, US 'kɔːr-/ *noun*

ڕاو یان ڕاونانی کەرویشک بە تاجی، ڕاوەکەرویشک بە تاجی: *hare coursing* ◊ شکار خرگوش با سگ

**court** /kɔːt, US kɔːrt/ *noun*

1 دادگا، دادگە، بارەگا، دەربار، سەرا، کۆشک، دیوەشا: *the - ◊ the civil/criminal courts* 2 (وەرزش) یاریگا: *urt of Queen Victoria* 3 *a tennis ◊ a squash/badminton court* حەوشە، حەسار 4 لقێ لە کۆمەڵی 5 دەستەی قانوون‌دانەران 6 (لە بریتانیا) لاشەقامی بنبەست 7 زمان‌لووسی، مەرایی، نەرمەبری 8 دەربڕینی خۆشەویستی ◊ 1 دادگاه، دربار 2 (ورزش) زمین 3 حیاط 4 شاخه‌ای از جمعیت 5 هیأت قانون‌گذاری 6 کُرت 7 چاپلوسی 8 اظهار عشق

**court card** *noun*

وێنە، ئەکس (شا، بی‌بی، سەرباز لە پاستوردا) ◊ صورت

**court dress** *noun*

جلەکۆشک، بەرگی کۆشک و سەرا ◊ لباس قصر

**courteous** /'kɜːtiəs, US 'kɜːrt-/ *adjective*

بەڕەوشت، بەتورە، بەماریفەت، بەڕەوشتانە، *a courteous young man* :civil :courteously /'kɜːtiəsli, US 'kɜːrt-/ *adv*) courteousness /'kɜːtiəsnəs, بەڕەوشتانە: US 'kɜːrt-/ *n*) ◊ مؤدب، مؤدبانە

**courtesan** /ˌkɔːtɪ'zæn, US 'kɔːrtɪzn/ *noun*

سۆزانی، حیز (ژن، جاران، ب.ت. یەکێ کە مشتەری کەڵەکەڵە و دەوڵەمەند و لە چینی سەرەوەی هەبێ) ◊ روسپی

**courtesy** /'kɜːtəsi, US 'kɜːrt-/ *noun* (*pl.* courtesies), *adjective*

*n* ڕەوشت، ماریفەت، چاولێبوون، ڕەفتارجوانی، ڕێزلێنان، دووقەدبوون، بۆچەمانەوە، داهاتنەوە، کوڕنش: *I was treated with the utmost courtesy by the staff* لە رووی ڕەوشت 1 *adj* یان ڕێزەوە 2 خۆڕایی، بەلاش ◊ *n* ادب، ملاحظه، احترام، تعظیم *adj* 1 از روی ادب یا احترام 2 رایگان

**courtesy light** *noun*

چرای ڕووناکی نێو ماشین، چرای نێوەوەی ماشین ◊ چراغ داخل اتومبیل

**courtesy title** *noun*

سەرناو یان ناونیشانی شانازی(یانە)، سەرناو یان پۆستی داب‌ودەستووری‌یانە (ب.ت. کوڕ یان کچی لۆرد) ◊ لقب افتخاری

**courthouse** /'kɔːthaʊs, US 'kɔːrt-/ *noun*

جسارت

**courante** /kʊ'rɒ̃t, US -'rɑːnt/ *noun*

جۆرێ سەمای کرژی فەرەنسی ◊ کورانت

**courgette** /kʊə'ʒet, kɔː'ʒet, US kʊr'ʒet/ *noun*, also zucchini

(ڕووەکناسی) کوولەکەسەوزە ◊ کدو سبز

**courier** /'kʊriə(r)/ *noun*

1 نامەبەر، چەپەر، تەتەر، پەیک 2 ڕێنوێن و یاریدەدەری گەڕوانەکان ◊ 1 پیک، قاصد 2 راهنما و کمک‌کنندەی گردشگران

**courlan** *noun*

کۆرلان: جۆری باڵندەی ئەمریکایی دەنووک‌درێژ ◊ کورلان

**course** /kɔːs, US kɔːrs/ *noun*

1 ڕێڕەو، ڕێگا، ڕێ، ڕەوڕەوە، ڕێک، ڕەوت، ڕەوەند: *He radioed the pilot to change course* 2 ماوەی، مەودای 3 شێوە، شێواز، تەرز 4 خولی وانە، وانە، پۆل، بواری خوێندن: *a French/chemistry, etc. course* 5 ئاوەڕۆ 6 بەش، پشک (خۆراک) 7 یاریگا، گۆرەپان 8 تێپەڕینی کات 9 ڕیز، ڕەگ، چین 10 چارەسەری، زنجیرە چارەسەرییەکی پزشکی 11 (کۆن) بادەوە یان چارۆکەی خوارەوە (ی کەشتی) 12 (زوو لە چیرۆکی پاڵەوانان‌دا) خان، قۆناخ، ڕووداو 13 (courses) بێ‌نوێژی (فریز و زاراوەکان: in (the) course of: لە ماوەی، لە کاتی، لە میانەی، د پێغاژۆیا ◊ in due course: لە کاتی خۆی‌دا، لە جێی خۆی‌دا، لە زەمانی خۆی‌دا ◊ time = in the course of 'time ◊ in the ordinary, normal, etc. course of events, things, etc.: بە شێوەیێکی ئاسایی یان سروشتی، بە خۆی، of course ◊ normally: بێ‌گومان، هەڵبەت) ◊ 1 مسیر، جریان، راه، روند 2 طول 3 روش، طرز 4 دوره، درس، کلاس، رشته 5 مجرا 6 بخش (خوراک) 7 زمین بازی، میدان 8 مرور زمان 9 ردیف، رگ 10 معالجه 11 بادبان پایین 12 مرحله، خان 13 (در جمع) قاعده

**course of action** *noun*

ڕەوڕەوەی کار، شێوازی کار، ڕەوتی کار ◊ روال کار، نحوەی کار

**course of nature** *noun*

ڕەوتی سروشت ◊ جریان طبیعت

**course of the time** *noun*

ڕەوتی کات ◊ جریان زمان

**course of the world** *noun*

ڕەوت یان ڕەوڕەوەی جیهان ◊ جریان جهان

**courser**[1] *noun*

1 ئەسپی تونڕەو یان خێرا، ئەسپی خۆشبەز یان تیزڕەو، ئەسپی باو و بۆران 2 تاجی، تانجی، تاژی ◊ 1 اسب تندرو 2 تازی

**courser**[2] *noun*

1 (خانووبـــــەرە) دادگـــــا 2 نووســــینگە و بەڕێوەبەرایەتی ستان 3 ناوەند یان بنکەی هەرێم ◌ 1 دادگاه 2 دفتر یا اداره استان 3 مرکز بخش
**courtier** /'kɔːtiə(r), US 'kɔːrt-/ *noun*
یار یان هاوڕێ، دەرباری، پاشمیر (شا و شاژن) ◌ درباری، ملازم
**courtly** /'kɔːtli, US 'kɔːrt-/ *adjective* (courtlier, courtliest)
بەڕەوشت، بەتورە، بەئەدەب ◌ مؤدب
**court-material** *noun*
دادگای لەشکری یان سەربازی ◌ دادگا یا محکمه نظامی
**court of appeal** *noun*
دادگای راستکردنەوە، دادگای پیاچوونەوە ◌ دادگاه استیناف
**court of cassation** *noun*
دادگای هەڵوەشاندنەوە یان پووچەڵکردنەوە ◌ دادگاه الغاء
**court of enquiry** *noun*, also court of inquiry, pl. courts of enquiry
1 دادگای لێکۆڵینەوە 2 دەستەی لێکۆڵینەوە ◌ 1 دادگاه تحقیق 2 هیأت رسیدگی
**court of justice** *noun*
دادگا ◌ دادگاه
**court of law** *noun, pl.* courts of law, also law court
دادگا ◌ دادگاه
**court of review** *noun*
دادگای پیاچوونەوە یان چاوپیاخشاندنەوە ◌ دادگاه تجدیدنظر
**Court of St Jame's** *noun*
دادگای حکومەتی بریتانیا ◌ دادگاه حکومت بریتانیا
**Court of Session** *noun*
(سکاتلەند) دادگای بەرز، دادگای باڵا ◌ دیوان عالی
**court order** *noun*
بڕیار یان دەستووری دادگا ◌ قرار دادگاه
**court plaster** *noun*
مشەمای سریشی ◌ کورت پلاستر
**courtroom** /'kɔːtruːm, -rʊm, US 'kɔːrt-/ *noun*
دادگا، ژووری دادگا ◌ دادگا، اتاق دادگاه
**courtship** /'kɔːtʃɪp, US 'kɔːrt-/ *noun*
1 دڵـداری، عیـشقبـازی، عیـشق و ئەڤـین: *They married after* ◊ *courtship displays* 2 راکێشان، *a short courtship* ،*the company's courtship* سەرنجڕاکێشان: *by the government* ◌ 1 معاشقه 2 جلب
**court shoe** *noun*
جۆرێ کەوشی ژنان (تەخت) ◌ نوعی کفش زنان
**court tennis** *noun*
(ئەمریکا) تێنیسی راستی ◌ تنیس واقعی
**courtyard** /'kɔːtjɑːd, US 'kɔːrtjɑːrd/ *noun*
حەوشە، حەسار ◌ حیاط
**couscous** /'kʊskʊs, US 'kuːskuːs *noun*
کوسکوس (= جۆرێ خۆراکی ئەمریکای باکووری) ◌ کیوس‌کیوس
**cousin** /'kʌzn/ *noun*
1 مامۆزا، ئامۆزا 2 خاڵۆزا 3 پوورزا، میمکەزا (چ کوڕ یان کچ) 4 خزمی دوور، بۆرەخزم، کوێرەخزم ◌ 1 عموزاده 2 دایی‌زاده 3 عمه‌زاده، خاله‌زاده 4 خویشاوند دور
**cousin-german** *noun*
1 مامۆزا، ئامۆزا 2 خاڵۆزا 3 پوورزا، میمکەزا (چ کوڕ یان کچ) ◌ 1 عموزاده 2 دایی‌زاده 3 عمه‌زاده، خاله‌زاده
**cousinry** /'kʌznri/ *noun*
مامۆزاکان، ئامۆزاکان، خاڵۆزاکان، پوورزاکان ◌ کوزینری
**cousinship** /'kʌznʃɪp/ *noun,* also cousinhood /'kʌznhʊd/
مامۆزاکان، ئامۆزاکان، خاڵۆزاکان، پوورزاکان ◌ کوزینری، کوزینشیپ
**couth** /'kuːθ/ *adjective*
(بە شۆخی) ماقووڵ، بەڕەوشت، ئاکارجوان، ◌ بانزاکت polished ،sophisticated
**couthy** /'kuːθi/ *adjective*, also couthie
1 (سکاتلەند) گەرموگوڕ، رووخۆش، دۆستانە، خۆمانە 2 خۆش، راحەت ◌ 1 دوستانه 2 راحت
**couture** /ku'tjʊə(r), US -'tʊr/ *noun, adjective*
*n* 1 (فەڕەنسی) دیزانی جلوبەرگ، بەرگکێشی، بەرگڕێژ 2 بەرگە داڕێژراوەکان، جلوبەرگی داڕێژراو *adj* دوایین داب ◌ *n* 1 طراحی لباس 2 لباس‌های طراحی‌شده *adj* آخرین مد
**couturier** /ku'tjʊəriei, US -'tʊr-/ *noun*
(فەڕەنسی) بەرگکێش، بەرگڕێژ، دیزاینێری جلوبەرگ ◌ طراح لباس
**couturière** /kuː'tjʊəriɛː/ *noun*
(فەڕەنسی) بەرگڕێژ، دیزاینێری جلوبەرگ (ژن) ◌ طراح لباس (زن)
**couvade** /kuː'vɑːd/ *noun*
کوڤاد (نەریتێکی هێندێ چاند کە مێرد بە نیشانەی هاوسۆزی لەگەڵ ژنەکەیدا لەجێ دەکەوێ و ژانوبرکی منداڵبوون دەکێشێ و بۆ ماوەیێ خەریکی رۆژووگرتن و خۆخاوێنکردنەوە دەبێ) ◌ کوواد
**couverture** /'kuːvətjʊə/ *noun*
جۆرێ چاکلێت یان نوقڵ ◌ نوعی شکلات
**covalence** /ˌkəʊ'veɪləns, US ˌkoʊ-/ *noun*
(کیمیا) کۆڤالێنس، پێکەوەهاوهێزی؟ ◌ کووالانس

**covalent** /ˌkəʊˈveɪlənt, US ˌkoʊ-/ *adjective*
کۆڤــالێنت، کۆڤالێنـــی، پێکـــەوەهاوەیز؟ ۞ کووالانـــی

**covalent bond** *noun*
بەندی کۆڤالێنت یا کۆڤالێنـــی ۞ پیوند کووالانـــی

**covalent radius** *noun*
لاتیرە یا نیوەتیرەی کۆڤالێنت ۞ شعاع کووالانسی

**cove** /kəʊv, US koʊv/ *noun*
1 لاکەنـداو، لاوچۆکـە، لاوچکـە 2 گـەچبـڕی نێوچـاڵ، تـاقی چـاڵ 3 ئەشـکەوت، پـەناێ لـە داوێنی کێو 4 مرۆ، بنیادەم ۞ 1 خور، خلیجک 2 گچبری توگود 3 پناه در دامن کوه 4 آدم

**covellite** /kəʊˈvelaɪt/ *noun*, also covelline /kəʊˈvelaɪn/
کانێکی شین، سولفایدی مس پێکدێنێ ۞ کوولایت

**coven** /ˈkʌvn/ *noun*
کۆڕ یان کۆبوونەوەی جادووگەران ۞ محفل یـا جلسـەی جادوگران

**covenant** /ˈkʌvənənt/ *noun*
1 رێککەوتننامە، بڕیارنامە، پەیمان، بەڵـێنی، گفـت 2 بەڵـێنی یـان بەڵـێنداری پێدانی خێـر و خێـرات 3 پـەیمان و بەڵـێنی خـودایی ۞ 1 توافقنامـه، قـرارداد، میثـاق، عهـد، بیعـت 2 تعهـد پرداخت صدقه 3 وعدەی الهی

**covenanted** *adjective*
1 رێککەوتوو، پـەیماندراو 2 پـەیمانبەستە ۞ 1 موافقتشده 2 متعهد

**covenantor** *noun*
پێیەنـد، دەربەسـت، پـەیماندەر، پـەیمانبەسـتە، بەڵێنیداو ۞ متعهد

**Coventry** /ˈkʌvəntri, US ˈkɒv-, BrE also ˈkɑːv-/ *noun*, send someone to Coventry
1 ڕووەرگێـــران، خۆبـــواردن، خـــۆلادان، پڕینگانـــەوە، قـــسەنەکردن، تـــوخننەکـــەوتن، قەڕەنەکەوتن 2 دابڕین یـان داگـۆڕینی پێوەنـدی (لەگەڵ کەسێ) ۞ 1 رویتابی 2 قطع رابطه

**cover** /ˈkʌvə(r)/ *noun*
1 داپۆشـــــین، (دا)پۆشـــــاندن، پۆشـــــشت، ڕووماڵ(کـردن)، داپێچـان، بـەرگ، داپۆشـە، سـەرپۆش، ڕوو، شەلـتە، سـەرقاپ، سـەر، درگـا، پـەردە، ڕووکـێش، سـەرکێش، داپۆشـک: *a plastic waterproof ◊ cushion cover* 2 بـەرگ (کتێـب، ڕۆژنامە، کۆڤار و هتـد): *the front/back cover* 3 بەرگەنامـە 4 داڵـدە، پارێزگـا، پـەنا، سـامە، چـراغ: *Everyone ran for cover when it started to rain* 5 پاراسـتن، ئاگالێبـوون 6 پـشتیوان، پـشتیوانە 7 ناسـنامەی درۆ، ناسـنامەی فـروفێلاوی یـان سـاختە 8 گژوگیـا، سـەوزە، سەوزایی، شینکاتی، شیناوەرد (ئەو ڕووەکانەی کە لەسەر عەرز شینبوون): *The total forest cover of the earth is decreasing* 9 بیمـە: 10 جێ، *cover against accidental damage* جێگا (لەسـەر مێزی نانخـواردن) 11 (covers) نوێن، پێخەف 12 جێبەجێکردنی کار و ئەرکی کەسێکی تر ئەگەر لەوێ نەبێ، جێگری ۞ 1 پوشـش، روکـش 2 جلـد 3 پاکـت 4 پناهگـاه 5 حفاظت 6 پشتوانه 7 هویت جعلی 8 پوشش گیاهی 9 بیمه 10 جا 11 (در جمع) رواناز 12 جانشینی

**coverage** /ˈkʌvərɪdʒ/ *noun*
1 ڕاپـــۆر، ڕاپـــۆرت 2 ڕادەی لێکۆڵـــینەوە و بـاسکـردن، داپۆشـین، پۆشـشت، (دا)پۆشـاندن، ڕووماڵاندن، ڕووماڵکردن: *the news coverage* 3 داپۆشین، (دا)پۆشاندن، پۆشـشت، *of the trial* داهێنان، سەرنانەوە، تەفزاندن، داگرتن، گرتنـەوە 4 بیمەلەســەر، بیمـە ۞ 1 گـزارش 2 پوشـــش 3 پوشش، شمول 4 مورد بیمه، بیمه

**coveralls** /ˈkʌvərɔːlz/ *noun*, also coverall
بەرگی کار ۞ لباس کار

**cover charge** *noun*
کرێ یان پارەی مێز، مێزانە، پارە یـان خـەرجی نەگۆڕی مێز (خواردنگە) ۞ پول میز

**cover crop** *noun*
بەرهەمی شێوەردی یا پارێزەر ۞ محصول پوششی

**covered** /ˈkʌvəd, US -vərd/ *adjective*
1 داپۆشراو بە، داگرتوو (تویژاڵ): *The walls were covered with pictures* 2 بـەمیچ، میچدار، سـەرگیراو، سەرداپۆشـراو: *a covered area of the stadium with seats* ۞ 1 پوشیده از 2 سرپوشیده

**covered wagon** *noun*
واگـۆنی مـیچچـەماو (- جـاران لـە ئـەمریکای باکووری خەڵـک هـاتوچۆیـان پێدەکـرد) ۞ دلیجان

**cover girl** *noun*
جوانی ڕووبەرگ ۞ ستارەی روی جلد

**covering** /ˈkʌvərɪŋ/ *noun, adjective*
*n* داپۆشە، پۆشـە، ڕووپۆش، ڕووکێش، سەرکێش، داپۆشـک، سـەرپۆش، بـەرگ *adj* سـەرنەرەوە، داپۆشەر (لەشکری) ۞ *n* پوشش *adj* پوششی

**covering fire** *noun*
ئاگر(باران)ی پشتیوانی یـان داپۆشـین ۞ آتـش پوششی

**covering letter** *noun*, also cover letter
نامەی پاشکۆ، نامەی ڕوونکردنەوە ۞ نامەی موشح

**covering power** *noun*
(کیمیا) توانایی داپۆشین ۞ قدرت پوشش

**coverlet** /ˈkʌvələt, US -vərl-/ *noun*, also bedspread
سەرتەخت، بەرگەتەخت، پۆپەشمین، ڕووتەخت، ڕوونوێن، بەرگی جێوبان، سـەرەخەرە، جـاجم

**cow** /kaʊ/ *noun*
1 ولاخ، مانگا، چێڵ 2 مێ، دێڵ، دیلەقوو (قەیەکی ساردوسووکە بۆ ژن)؛ (لە ئەوستراڵیا و نیوزیلەند) کەس یان شتێکی ناپەسند؛ بنەڕەت: *cū* ئینگلیسی کۆن، ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ 1 گاو، ماده گاو 2 ماده؛ کو

**coward** /ˈkaʊəd, US -ərd/ *noun*
کەسێکی بێ‌جەرگ، ترسەنۆک، نەوێر، نەوێرەک، تسکەن ◌ آدم ترسو، بزدل

**cowardice** /ˈkaʊədɪs, US -ərd-/ *noun*
ترسەنۆکی، حیزی، بێ‌جەرگی، زراوچوویی، دژی bravery و courage ◌ بزدلی، ترسویی

**cowardiness** *noun*
ترسەنۆکی، حیزی، نەوێری، نەوێرەکی، بێ‌جەرگی، زراوچوویی ◌ بزدلی، ترسویی

**cowardly** /ˈkaʊədlɪ/ *adjective*
بێ‌جەرگ، ترسەنۆک، حیز، نەوێر ◌ ترسو، بزدل

**cowbane** /ˈkaʊəbeɪn/ *noun*
(رووەکناسی) گاکوژە، گاگۆڕاڵ [ *Cicuta virosa* و جۆرە پێوەندیدارەکان ] ◌ شوکران آبی

**cowbell** /ˈkaʊbel/ *noun*
زەنگوڵەی مانگا، زەنگوڵەگایانە ◌ زنگولەی گاو

**cowberry** *noun, pl.* cowberries, also lingonberry
(رووەکناسی) دەوەنێکی هەمیشەسەوزی کورتەباڵای باکووری، بەرێکی سووری تۆخ دەگرێ [*Vaccinium vitis-idaea*] ◌ کوبری

**cowbind** *noun*
(رووەکناسی) مێوەمارانە، ترێ‌مارانە ◌ فاشرا

**cowbird** *noun*
(باڵندەناسی) گاباڵندە، باڵندەگایانە [ *Molothrus ater* (هی سەرقاوەیی) و جۆرە پێوەندیدارەکان] ◌ نوعی پرنده

**cowboy** /ˈkaʊbɔɪ/ *noun*
گاوان، مانگاوان، گالەوەڕێن ◌ گاوچران

**cowboy hat** *noun*
کڵاوی کاوبۆی ◌ کلاه کابوی

**Cowboys and Indians** *noun*
شەڕی کاوبۆی و سوورپێستەکان ◌ جنگ میان کابوی‌ها و سرخ‌پوست‌ها

**cow-calf** *noun*
گوێلک یان گوێرەکەی مێ ◌ گوسالەی ماده

**cowcatcher** /ˈkaʊkætʃə(r)/ *noun*
سپەری پێشەوە (شەمەندەفەر) ◌ سپر جلو

**cowed** /kaʊd/ *adjective*
ترساو، زراوچوو، زەندەقچوو، تۆقیو ◌ ترسیده، مرعوب

**cowfish** *noun, pl.* same or cowfishes
گاماسی، ماسیەگایانە، جۆرێ boxfish بە بربڕەی شاخ‌ئاسا لەسەر سەری [ *Lactoria diaphana* و جۆرەکانی تر] ◌ نوعی ماهی

◌ روتختی

**cover note** *noun*
بیمەنامەی کاتی یان قۆناخی ◌ بیمەنامەی موقت

**cover-shame** *noun*
بیانوو، پەڵپ، گورپ، بەهانە ◌ بهانه

**cover story** *noun*
(ڕۆژنامە، کۆڤار و...) بابەت یان مژاری سەرەکی ◌ مطلب اصلی

**covert** /ˈkʌvət, US ˈkəʊvɜːt/ *adjective*
1 شاراوە، نادیار، حەشاردراو، نەلەبەرچاو، داپۆشراو، نهێنی، نەتەنی، پەنامەکی، نائاشکرا، بە دزییەوە، بێ‌تەقەورەقە، لە بنەوە 2 بەمێرد، بەشوو، مێرددار (ماف) ◌ 1 مخفی، پنهانی، نهفته، مستور، ناآشکار، یواشکی 2 مُحصنه

**covert** /ˈkʌvət, US -vərt/ *noun*
1 حەشارگە، پەنا، جێ‌پەنا، کون، داڵدە، نەهێنگە 2 بێشە(لان) 3 (باڵندەناسی، هەروەها tectrix) پەڕی داپۆشەر، پەڕێ کە بنی پەڕەگەورە یان پەڕی کلکی باڵندەیێ دادەپۆشێ ( covertness *n*) ◌ 1 مخفیگاه 2 بیشه 3 کاورت

**covert activity** *noun*
چالاکی نهێنی ◌ فعالیت پنهانی

**covertly** /ˈkʌvətli, US -vərtli/ *adverb*
بە دزییەوە، بە نهێنی: *She watched him covertly in the mirror* ◌ مخفیانه

**coverture** /ˈkʌvətjʊə/ *noun*
بەرگی شاردنەوە یا پاراستن، پەنا، داڵدە، بەرگ، سەرپۆش، داپۆشە ◌ پوشش حفاظی، پوشش

**cover-up** *noun*
سەرنانەوە، دیزەبەدەرخۆنە، داپۆشین، پەردەپۆشکردن، نوخوماندن، تەقزاندن: *his garrulousness is a cover-up for insecurity* ◌ لاپوشانی

**cover version** *noun*
تۆمارکردنەوەی گۆرانییەکی کۆن لە لایەن باند یان گۆرانیبێژێکەوە ◌ کوورت ورسیون

**covetous** /ˈkʌvətəs/ *adjective*
1 خوازیار، تامەزرۆ، بەپەرۆش، بەتەما، ئارەزوومەند: *covetous of power* 2 بەتەماح، پیسکە، چاوچنۆک، چاوچوو، چاوچڵێس، چاوبرسی، ڕژد ◌ 1 مشتاق 2 آزمند، حریص

**covetously** /ˈkʌvətəsli/ *adverb*
ڕژدانە، چاوچنۆکانە، دەس‌قووچاوانە ◌ آزمندانه

**covetousness** /ˈkʌvətəsnəs/ *noun*
بەتەماحی، پیسکەیی، چاوچنۆکی، چاوچڵێسی، چاوبرسێتی، ڕژدی ◌ حرص، آزمندی

**covey** /ˈkʌvi/ *noun, pl.* coveys
دەستە، پۆل، ڕەوە (ب.ت. کەو) ◌ گروه

**covin** /ˈkʌvɪn/ *noun*
(کۆن) سازوباز، فڕوفێڵ، فێڵوتەڵەکە، پیلان، deception ،fraud ◌ تبانی، توطئه

**cowgirl** /'kaʊgɜ:l, US -gɜ:rl/ *noun*
گالەوەڕێن، گاوان (کچ) ۞ گاوچران
**cowhand** /'kaʊhænd/ *noun*
گالەوەڕێن، گاوان ۞ گاوچران
**cowherd** /'kaʊhɜ:d/ *noun*
گالەوەڕێن، گاوان ۞ گاوچران
**cowhide** /'kaʊhaɪd/ *noun*
1 چەرم، گاوس، کەوڵ یان پێستەی مانگا 2 شیلاق، جەڵدە ۞ 1 چرم یا پوست گاو 2 تازیانە
**cowish** /kaʊɪʃ/ *adjective*
1 مانگائاسا، وەکوو مانگا 2 حیز، ترسەنۆک، نەوێرەک ۞ 1 گاومانند 2 ترسو
**cowl** /kaʊl/ *noun*
1 کەوڵ (کڵاودار)، کەوای کڵاودار 2 کڵاوە، سەر(دووکەڵکێش) 3 = cowling (cowled *adj*) ۞ 1 خرقەی باشلق‌دار 2 کلاهک
**cowlick** /'kaʊlɪk/ *noun*
فزکلـە، کـاکۆڵ، گودلـە، توالـیت، تونجـک (قژەسەر) ۞ کاکل
**cowling** /'kaʊlɪŋ/ *noun*
سەرقاپی مۆتۆڕ، بەرگەبزوێنە، بەرگەمۆتۆڕ ۞ سرپوش موتور
**cowman** *noun, pl.* cowmen
گالەوەڕێن، گاوان ۞ گاوچران
**cow-milker** *noun*
مانگادۆش، سەتڵ ۞ گاودوش
**co-worker** *noun*
هاوکار ۞ همکار
**cow parsley** *noun*
کۆوپارسلەی، زوورکەگایانە؟ (گیایەکی خۆرسکی ئەورووپایی بە گوڵێکی سپی زۆرەوە [*Anthriscus sylvestris*]) ۞ نوعی گیاه
**cow parsnip** = hogweed
**cowpat** /'kaʊpæt/ *noun*
شیاکە، ریخ، ڕەم ۞ تاپاله
**cowpea** /'kaʊpi:/ *noun*
1 لوبیا؟، پۆلکەگایانە، گانۆکە [*Vigna unguiculata*] 2 دانی گانۆکە ۞ 1 نوعی گیاه 2 دانەی این گیاه
**cowpen** /'kaʊpen/ *noun*
گاوسوو، پشتیری گاگەل، گاوخان، تێولەی ولاخ ۞ طویلەی گاو
**Cowper's gland** *noun,* also bulbourethral gland
(توێکاری) رژێنەی کۆوپیر یان کوپێر: هەریەک لەو جووتە رژێنە چکۆلەی بنکی سیرەت لەژێر رژێنەی پرۆستاتەوە کە پێکهێنەری شلەی تۆماو دەردەدەن (بنەرەت: لە ناوی نەشتەرگەر یان توێکاری ئینگلیسی William *Cowper*، مەرگ 1709) ۞ غدەی کوپر
**cowpoke** = cowboy
**cow pony** *noun*
ئەسپی تایبەتی گالەوەڕێنەکان ۞ اسب مخصوص گاوچران‌ها
**cowpox** /'kaʊpɒks, US -pɑ:ks/ *noun*
ئاولەی ولاخی یان مانگایی، ئاولەی رەشەولاخ، گاولە، کاوپاکس، بە هۆی پۆکسیڤایرۆسێکەوە poxvirus بە ناوی (جۆر *Cowpox virus* لە تـوخمی *Orthopoxvirus*) تـووش بـێ (goatpox: دانوو، ئاولەی بزن) ۞ آبلەی گاوی
**cowpuncher** = cowboy
**cowrie** /'kaʊri/ *noun,* also cowry, *pl.* cowries
1 جۆرێ لەشنەرمی سکپای gastropod دەریایی، لەیەکەیێکی کۆم و لووس و بە کونێکی درێژ و باریکی هەیە [توخم *Cypraea*: گەلێ جۆرن] 2 کوژەکە، کوزژا، کەوری (لەپێکێکی چکۆلانە (هی لەشنەرمێکی وا) کە جاران لەجیاتی پارە لە چەند بەشێکی ئاسیا و ئەفریکا بەکاردێترا) ۞ کائوری
**co-writer** *noun*
هاونووسەر ۞ کورایتر
**cowshed** /'kaʊʃed/ *noun*
تێولە، تەویلە، گاوبەند، گاوسوو، گەوڕ، پشتیر ۞ طویله، گاودانی
**cowskin** *noun*
کەوڵی مانگا، چەرم یا پێستەی ولاخ ۞ پوست گاو
**cow's lungwort** *noun*
(رووەکناسی) گوێگەم، گاولمە، گاورمە ۞ گل ماهور
**cowslip** /'kaʊslɪp/ *noun*
1 هەرالـە، گـوزروان، زمانـەگا، هالـەکۆکی [*Primula veris*] 2 = (ئەمریکای باکووری) marsh marigold ۞ پامچال طبی، گل گاوزبان
**cow wheat** *noun*
گاگەنمە؟، گەنمەگایانە؟ (گیایێکی نیمچەمشەخۆر بە گوڵی زەردەوە [*Melampyrum pretense*] و جۆرە پێوەندیدارەکان]) ۞ نوعی گیاه
**Cox** *noun,* also Cox's orange pippin
جۆرێ سێوی ئینگلیسی ۞ کوکس
**cox** /kɒks, US kɑ:ks/ *noun*
سوکاندار، فەرمانگر، فەرماندار، کەشتی‌لێخوڕ (بەلەمی سەوڵدار) = coxswain (coxless *adj*) ۞ سکاندار
**coxa** /'kɒksə/ *noun, pl.* coxae /-si:/
1 (توێکاری) سمتەجوولە، ئێسکی سێبەندە یان جومگەی ئێسکی سێبەندە 2 (مێرووناسی) بەشی بنەرەتی یا یەکەمینی لاقی مێروو (بنەرەت: لاتین "hip") ۞ 1 استخوان لگن‌خاصره یا مفصل استخوان لگن‌خاصره 2 کوس
**coxal** *adjective*
1 سمتەجوولەیی، سەربە ئێسکی سێبەندە یان

جومگـەی ئێـسکی سـێبەنـدە 2 سـەربە بەشـی بنەڕەتی یان یەکەمینی لاقی مێروو ◌ 1 وابـسته بـه اسـتخوان لگـن‌خاصـره یـا مفـصل اسـتخوان لگن‌خاصره 2 کوسال

**coxcomb** /'kɒkskəʊm/ *noun*

1 گـەوجی لـەخۆبایی (ب.ت. کەسـێ کـە سـەرنجێکی زۆر دەداتـە جـلوبـەرگی) 2 = cockscomb ( coxcombical

**coxcombical** /'kɒkskəʊmɪkl/: *adj* خۆپیـسـشاندەر، خۆوادەرخەر، خۆنوێنەر) ◌ احمق مغرور

**coxcombry** /-kəmri/ *noun*

واخۆدەرخستن، خۆنواندن ◌ تظاهر، خودنمایی

**Coxsackie virus** /kɒk'saki, kʊk-/ *noun*

(پزشکی) ژمارەیێ enterovirus کە پێوەندی بە هێنـدێ نـەخۆشـی مـرۆڤ (وەک menengitis) ـەوە هـەیـە (بنـەڕەت: لـە نـاوی *Coxsackie* هەرێمی نیویۆرک، یەکەمجار ئەو بابەتە لەوێ دەس‌نیشان‌کرا) ◌ کوکساک ویروس

**coxswain** /'kɒks(ə)n/ *noun*

1 سـوکان‌دار، فـەرمان‌گـر، کەشـتی‌لێخـوڕ، سوکان‌گر 2 ئەفسەری (پایەنزمی) کارکـەرانی کەشتی (ی‌ێکی چکۆلانە یان ژێردەریایی هێزی دەریایی پاتشایی) ◌ 1 سکان‌دار 2 کوکسن

**coxswainship** /'kɒks(ə)nʃɪp/ *noun*

سـوکان‌داری، فـەرمان‌گـری، کەشـتی‌لێخـوڕی، کەشتی‌ئاژۆیی ◌ سکان‌داری

**Cox-2 inhibitor** *noun*

دەستە دەرمانێ کە بۆ چارەسەرکردنی ژان و ئاوسـانی inflammation جومگـەکـان بەکاردێترێ ◌ کوکس 2 انهیبیتور

**Coy** *abbreviation (army)* company

**coy** /kɔɪ/ *adjective* (coyer, coyest)

1 شـەرمن، کـەمڕوو 2 پـڕناز، بـەناز، بەعیـشوە، بەکریشمە، سـرک: *She gave me a coy smile* ◌ 1 خجول 2 باکرشمه

**coyly** /kɔɪli/ *adverb*

1 بە نازەوە، بە کریشمەوە 2 شـەرمنانە ◌ 1 بـا کرشمه 2 خجولانه

**coyness** /kɔɪnəs/ *noun*

1 ناز، نازونووز، عیشوە، کریشمە 2 شـەرمێونی، کەمڕوویی ◌ 1 عشوه‌گری، کرشمه، عشوه 2 حجب

**coyote** /kaɪ'əʊti, BrE also US kɔɪ-, US -'oʊti, 'kaɪoʊt/ *noun*

(گیانـەوەرناسـی) کۆیـۆتی، کۆیـۆت: گـورگێکی چکۆلەی ئەمریکای باکووری [*Canis latrans*] (بنەڕەت: لە *coyotl* ناواتل Nahuatl) ◌ کویوت

**coypu** /'kɔɪpu:/ *noun, pl.* coypus

گیانـەوەرێکی زلـەی لـە سـەگاوچووی beaver-like کرتێنەری ئەمریکای باشووری، رادەگیرێ بۆ کەوڵەکەی [*Myocastor coypus*] ◌ کویپو

**coz** /kʌz/ = cousin

**cozenage** /'kʌzənɪdʒ/ *noun*

فریو، هەڵفریواندن، فێڵوتەڵەکە (cozener *n*) ◌ فریب

**cozy** = cosy

**cp.** *abbreviation* compare

**CP** *abbreviation* Communist Party

**CPA** *abbreviation* certified public accountant

**CPI** /ˌsi: pi: 'aɪ/ *abbreviation* consumer price index

**Cpl** *abbreviation,* (Cpl.) Corporal

**cps** *abbreviation* cycles per second

**CPU** /ˌsi: pi: 'ju:/ *abbreviation* central processing unit

**crab** /kræb/ *noun*

1 قـرژاڵ، قرژانـگ [دەسـتە Decapoda: زۆر جـۆرن] 2 گۆشـتی قـرژاڵ (بـۆ خـۆراک) 3 سێوەترشـە 4 مـرۆی رووتـرش و مـرومۆچ 5 ئەسپێی بەرگەدە، چنگنە 6 گران‌کێش (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ 1 خرچنگ 2 گوشـت خرچنـگ 3 سیب وحشی 4 آدم بدعنق 5 شپش زهار 6 جرثقیل

**Crab** *noun,* also Cancer

قرژاڵ، قرژانگ (= چوارەمین کەلوو لە زۆدیاک) ◌ سرطان

**crab apple** *noun*

(دار) سێوەکێوی، سێوەترشە ◌ سیب وحشی

**crabbed** /'kræbɪd, US kræbd/ *adjective*

1 رووتـرش، مـرومۆچ، ئێـسکقـورس، ئێسک‌گران، مۆن 2 هێڵ یان خەتی شەرەپشیلە، تەقلی‌بەتەقلی (ورد و سـەخت بـۆ خوێندنـەوە)، نـەخوێنراوە: *crabbed handwriting* ◌ 1 بدعنق 2 خط خرچنگ قورباغه

**crabbedly** /'kræbɪdli, US kræbdli/ *adverb*

رووترشانە، مرومۆچانە، بە مۆنی‌یەوە ◌ بابدعنقی

**crabbedness** *noun*

رووترشـی، مرومۆچی، مـۆنی، ئێـسکگرانی ◌ بدعنقی

**crabby** /'kræbi/ *adjective* (crabbier, crabbiest)

رووترش، مرومۆچ، مۆن، رووگرژ ◌ بدعنق

**crabgrass** *noun*

گیاقرژاڵـە (تـەرز فرێـدەدا و دەبێتـە بژارێکـی قورس [*Digitaria sanguinalis* و جۆرەکانی تر]) ◌ نوعی گیاه

**crablet** *noun*

بەچکە قرژاڵ ◌ بچەی خرچنگ

**crab-louse** *noun,* also crab louse

ئەسپێی بەرگەدە، چنگنە [*Phthirus pubis*] ◌ شپش زهار

**crabmeat** *noun*

گۆشتی قرژاڵ ۞ گوشت خرچنگ

**Crab Nebula** *noun*
(ئەستێرەوانی) تەمی قرژاڵی، قرژاڵەتەم ۞ سحابی خرچنگی

**crab spider** *noun*
جاڵجاڵۆکەی قرژاڵی [خێزان Thomisidae] ۞ نوعی عنکبوت

**crabstick** *noun,* also crab stick
1 گۆچانی دارە سێوەترشە 2 کەسێکی رووترش یان گرژ، مرۆی رووتاڵ ۞ 1 عصا از درخت سیب وحشی 2 آدم کج‌خلق

**crab tree** *noun*
داری سێوەترشە ۞ درخت سیب وحشی

**crabwise** /'kræbwaɪz/ *adverb*
لە تەنیشتەوە، لە پاڵەوە، لە لاوە، لابەلا، پڵۆچ ۞ کجکی، یک‌وَری

**crack** /kræk/ *noun, adjective*
*n* 1 قەڵەشت، قەڵەش، درز، قلیش، کەلێن، شەق، چرزە، کون، کونی چکۆلە: *Cracks began to appear in the walls* 2 لێدان، پیاکێشان 3 گرمە، نەرە، شریخە، زرمە 4 دەنگی گەورە و کتوپڕ 5 شۆخی، گاڵتە 6 هەوڵ، تێکۆشان 7 گرفت، خەوش، عەیب، کەم‌وکووڕی، ناڕێکی 8 کراک (دەرمانێکی کریستاڵی بەهێز و ناقانوونی لە شێوەی کۆکائین، وردە دەکرێ) *adj* 1 پوخت، لێزان، خاراو، کارامە، شارەزا، وەستا 2 دەنگ گربوون، بۆڕی (ب.ت. کاتی خۆناسین) ۞ *n* 1 ترک، شکاف، روزنە، سوراخ کوچک 2 ضربە 3 غرش 4 صدای بلند و ناگهانی 5 جوک 6 کوشش 7 نقص، عیب 8 کراک *adj* 1 کارکشتە، ماهر 2 برگشتگی صدا

**crackbrain** *noun*
مرۆی گەوج، بێ‌مێشک ۞ آدم احمق

**crackbrained** /'krækbreɪnd/ *adjective*
گەوج، کەر، بێ‌مێشک: *a crackbrained idea* ۞ احمق

**crackdown** /'krækdaʊn/ *noun*
توندوتیژی کردەوە، توندگرتن، سەرکوت، داپڵۆساندن، بەرەنگاربوونەوەی سەخت، بەگژداچوونەوە ۞ شدت عمل، سرکوب

**cracked** /krækt/ *adjective*
1 قەڵەشیو، چرژاو، درزبردوو 2 شێت، دەڵوو ۞ 1 ترک‌دار 2 دیوانە

**cracker** /'krækə(r)/ *noun*
1 غوراپی سوێر، توشەی سوێر 2 تۆقتۆقە 3 ژنی سەرنج‌ڕاکێش، لەبار ۞ 1 کراکر 2 ترقە 3 زن جذاب، لعبت

**cracker-barrel** *adjective*
سادە، هیچ‌نەزان، ساویلکە، بێ‌ئەزموون ۞ سادەلوح، بی‌تجربە

**crackerjack** /'krækədʒæk, US -kərdʒæk/ *noun*
کەسێک یان شتێکی یەکجار باش، ئەنتیکە ۞ آدم یا چیز فوق‌العادە

**crackers** /'krækəz, US -kərz/ *adjective*
(نافەرمی، زۆرتر لە بریتانیا) شێت، دەڵوو، ۞ دیوانە crazy insane

**cracking** /'krækɪŋ/ *noun, adjective*
*n* هاڕین، شکاندن، وردوخاش‌کردن، درز و قلیش *adj* یەکجارباش: *She's in -king form at the moment* ۞ *n* کراکینگ، درز و ترک *adj* عالی

**crackle** /'krækl/ *noun*
(دەنگ) قرچە، قرچەقرچ، قرچوهۆڕ، شریخەشریخ، شەقەشەق: *the distant -ckle of machine-gun fire* ۞ ترق‌وتوروق، خش‌خش

**crackle-china** *noun*
چینکۆی چرژاو یان درزبردوو (مووواوی)، درزنیشان ۞ چینی ترک‌دار

**crackle-ware** *noun*
چینکۆی چرژاو یان درزبردوو (مووواوی)، درزنیشان ۞ چینی ترک‌دار

**crackling** /'kræklɪŋ/ *noun*
1 قرچەقرچ، قرچوهۆڕ، شریخەشریخ، شەقەشەق 2 پێستی هەڵقرچاو یان برژاو، پێستی هەڵچزاو (گۆشتی بەراز، مریشک و هتد؛ 1 ۞ (cracklingly /'kræklɪŋli/ *adv* ترق‌وتوروق، ترق‌ترق 2 پوست برشتە

**cracknel** /'krakn(ə)l/ *noun*
1 جۆرێ تۆشە یان غوراپی تورت و سووک 2 جۆرێ شیرینی تورت و ناسک کە لە شەکری تواوە دروست دەکرێ ۞ کراکنل

**crackpot** /'krækpɒt, US -pɑːt/ *noun, adjective*
*n* کەسێکی شێت، شێتی بێ‌وەی، بنیادەمی شەڵوشێت (لەگەڵ بیروبۆچوونی سەیروسەمەرە) *adj* شێت ۞ *n* آدم دیوانە *adj* دیوانە

**cracksman** *noun, pl.* cracksmen
(نافەرمی) دز، چەتە، سنووق‌بڕ ۞ سارق

**crack-up** *noun*
1 وردوخاش‌بوون، تێک‌شکان، لێک‌وزەبەردران 2 شێتی ۞ 1 خردشدگی 2 دیوانگی

**crack willow** *noun*
قرچەبی، لقەکانی زوو قرین [*Salix fragilis*] ۞ نوعی بید

**-cracy** *suffix*
پاشگر: ساڵاری، میری، سەرداری، دەسەڵات، کراسی، ئاماژە بە شێوەیێکی تایبەتی حکومەت یان دەسەلاتی: *democracy* (بنەڕەت: لە *cratie* فەرەنسەوە، لە ڕێگای لاتینی سەدەکانی نێوەڕاستەوە، لە *-kratia* یۆنانی‌یەوە "power, rule") ۞ پسوند: ساڵاری، حکومت

**cradle** /'kreɪdl/ *noun*

1 لانک، دەرگووش، بێشکە، ماتک، دەیدیک (بەشەکانی بریتین لە: پایە (= ژێرپایە) یان گیاخورە؛ پاچک یان پایە (بە باری درێژایی)؛ کەللە، کەمە؛ لاوانە یان لابێشکە؛ لاوانەی کورت؛ سەرلانک یان سەربێشکە (= ئەو پارچەی دارەی کەوا دوو کەمە پێک دەبەستێتەوە)؛ دۆشەک؛ دەسرازە (سەرسنگە و سەرلاقە)؛ سەربێشکە، سەرلانکە؛ سەردەمە؛ قەلەم یان بلوور (= بلوێر)؛ گۆزەلە؛ قەفانچەلە 2 بنەما، ماک، سەرچاوە، ژێدەر، چاوگە 3 سەکۆ، پلاتفۆرم (دەجوولێ) 4 جێگای دەسکی تەلەفون، جێ‌دەسک ۞ 1 گهواره 2 مهد، خاستگاه 3 سکو 4 جای گوشی

**cradle arena** *noun*

سەرچاوە یان ژێدەری شارستانیەت، لانکەی شارستانیەت ۞ مهد تمدن

**cradle cap** *noun*

هەوکردن یان ئاوسانی inflammation پێستەسەر، لە ساوایان و شیرەخۆراندا، بە توێخی چەور و چەسپ و زەرباوەوە دیاری دەکرێ ۞ کریدل کاپ

**cradle roof** *noun*

میچ یان بانی لانکی، بانی بێشکەیی ۞ سقف گهوارەای

**cradle scaffold** *noun*

داربەستی لانکی، لانکەبەست ۞ چوب‌بست گهوارەای

**cradle scythe** *noun*

مەلەغانی بێشکەیی یان لانکی (= بۆ ڕێک‌وپێک‌کردنی دەغلی دووراو) ۞ کریدل سایت

**cradle-snatcher** *noun*

بە ئاخری پیری کلاش میکەری، ئاخری پیری جۆ بە تیری، بە پیری هەڵەسوون‌هێنان ۞ سرپیری و معرکه‌گیری

**cradle song** *noun*

لایەلایە، لایلایە ۞ لالایی

**cradling** *noun*

دابەستی داربەست، چوارچێوە (= بۆ ڕاگرتنی میچی گومەزی یان تاقی) ۞ چوب‌بست‌زنی

**craft** /krɑ:ft, US kræft/ *noun*

1 پیشەگەری، پیشەسازی، کار، پیشە، هونەر، پیشەگەری دەستی، کاری دەستی 2 لێزانی، وەستاکاری، شارەزایی، مامۆستایی، وەستایی، دەسڕەنگینی 3 بەلەم، گەمی، کەشتی 4 ژێردەریایی 5 فڕۆکە 6 کەشتی ئاسمانی 7 فێڵ، دهۆ، تەلەکە ۞ 1 صنعت، حرفه، صنایع دستی، صنعت‌گری 2 مهارت، زبردستی، استادی 3 قایق، کشتی 4 زیردریایی 5 هواپیما 6 سفینه 7 حیله، مکر

**crafted** *adjective*

وەستایانە، شارەزایانە ۞ ماهرانه

**craftily** /ˈkrɑ:ftɪli, US ˈkræftɪli/ *adverb*

بە فێڵ و فەرەجەوە، شەیتانانە ۞ مکارانه

**craftiness** /ˈkrɑ:ftinəs, US ˈkræftinəs/ *noun*

فێڵ، تەلەکەبازی، دهۆ، فرت‌وفێڵ، شەیتانی، زۆرزانی ۞ مکر، نیرنگ

**craftsman** /ˈkrɑ:ftsmən, US ˈkræf-/ *noun, pl.* craftsmen

1 پیشەگەر، وەستاکار، پیشەساز، سازگەر، سازکار 2 (Craftsman) سەربازی تایبەتی لێوەشاو لە یەکەی میکانیکی و کارەبایی هێزی پاتشایی(دا) ۞ 1 صنعت‌گر، استاد 2 کرافتسمن

**craftsmanship** /ˈkrɑ:ftsmənʃɪp, US ˈkræf-/ *noun*

پیشەگەری، پیشەسازی، وەستاکاری، سازگەری، مامۆستایی، شارەزایی، هونەرمەندی ۞ صنعت‌گری، استادی، هنرمندی

**craft union** *noun*

یەکێتی یان سەندیکای پیشەگەران (یان سازگەران) ۞ اتحادیەی صنفی

**craftsperson** /ˈkrɑ:ftspɜ:sn, US ˈkræftspɜ:rsn/ *noun*

پیشەگەر، پیشەساز، وەستاکار، سازگەر، سازکار ۞ صنعت‌گر، استاد

**craftswoman** /ˈkrɑ:ftswʊmən, US ˈkræf-/ *noun, pl.* craftswomen

پیشەگەر، پیشەساز، وەستاکار، سازکار (ژن) ۞ صنعت‌گر، استاد (زن)

**crafty** /ˈkrɑ:fti, US ˈkræfti/ *adjective* (craftier, craftiest)

فێلاوی، بەفێڵ‌وەفەرەج، زۆرزان، شەیتان، cunning، wily ۞ حقه‌باز، حیله‌گر، حقه‌باز

**crag** /kræg/ *noun*

(کێو) هەڵدێر، هەزاربەهەزار، هەڵەت، ما، کەمەر، ڕەوەز، کەژ، زەردوماهی، کەڕا، زنار، هەڵەمووت ۞ پرتگاه، صخره، کمر

**craggy** /krægi/ *adjective* (craggier, craggiest), also cragged

1 تەلان، لێژ، پڕهەڵدێر، زنارزنار، سەخت، هەڵەمووتاوی، هەڵەتاوی، نارێک: *a craggy coastline* 2 پیاوانە (دەم‌وچاو) ۞ 1 پرتگاهی، شیب‌دار، ناهموار 2 زمخت

**cragsman** *noun, pl.* cragsmen

شاخەوان، هەڵگژەوان ۞ کوه‌پیما

**crake** *noun*

باڵندەیێ لە تیرەی rail، بە دەنووکی کورتەوە ۞ نوعی پرنده

**crambo** *noun, pl.* cramboes

پاشڵێن، سەرواسەروا، سەروایێن (کایەیێ کە لەودا دەبێ سەروای هەڵبەستکە بدۆزرێتەوە) ۞ نوعی بازی

**cram-full** *adjective*

پڕ، دارماڵ، پڕیپڕ ۞ مملو، سرشار

**crammed** /kræmd/ *adjective*

پڕ، دارماڵ، سەرڕێژ، تژی ۞ مملو، پر، سرشار

**cramp**[1] /kræmp/ *noun*

1 جــەمام، گــیرانی بازوڵــە و ماســولکە، بەگیرویــستان، کزوڵــنج، گــیران 2 (cramps) ژانێکــی تونــد لــە گــەدەدا (یــان زگ)، دڵــەکزە، ژانەســک (ب.ت. لــە ئــەمریکا) ۞ 1 چنگــە، گرفتگی عضلانی 2 (در جمع) کرامپس، پیچش

**cramp**[2] /kræmp/ *noun*

1 قولاپ، قەلانگ 2 گیرە، بەست، دەسەگیرە ۞ 1 قلاب 2 گیره

**cramped** /kræmpt/ *adjective*

1 شەقلیبەتەقلی، نەخوێنراوە، ناخۆش 2 تەنگ، تەنگەبەر، کنگەجن، تەسک: *working in cramped conditions* ۞ 1 ناخوانا 2 تنگ

**crampon** /ˈkræmpɒn, US -pɑːn/ *noun*

1 قــولاپ، قــەلانگ 2 سەهۆڵــبڕ (ئــەڵــمانی بنەڕەت) ۞ 1 قلاب 2 یخشکن

**cranberry** /ˈkrænbəri, US -beri/ *noun, pl.* cranberries

1 (ڕووەکناسی) کرەنبێری، تووەقولنگ؟ (بۆ ســازکردنی ولولــە و ســۆس [*Vaccinium oxycoccos* (ئــەوروپــا)، *V. macrocarpon* (ئــەمریکــای بــاکووری) و جــۆرەکــانی تــر]) 2 سووری توخ ۞ 1 زغال اخته 2 قرمز سیر

**cranberry bush** = highbush cranberry

**crane**[1] /kreɪn/ *noun*

(گیانەوەرناسی) لەکلەک، قولنگ، شینەقورینگ [*Grus grus* (هی ئاسایی، ئوراسیا) و جۆرە پێوەندیدارەکان، خێزان Gruidae] ۞ دُرنا

**crane**[2] /kreɪn/ *noun*

بەرزکەرەوە، دەزگای هەڵێنان، جەرەسەقیل، گرانکێش ۞ جرثقیل

**crane fly** *noun*

(گیانەوەرناســی) مێــشەلەکلەک، لاقدرێــژە [*Tipula maxima* و جۆرە پێوەندیدارەکان، خێزان Tipulidae] ۞ پشەباغی

**crane's bill** *noun,* also cranesbill

(ڕووەکناســی) دەرزیلۆکــە، دەرزیدانــە [*Geranium pretense* (هی شیناوەرد) و جۆرە پێوەندیدارەکان] ۞ شمعدانی

**crani(o)-** /ˈkreɪniəʊ/ *prefix*

پێــشگر: کەڕاکــە، کاسەســەر، کاژەڵــە، ســەر، کەڕاکــــــەیی، کەڕاکــــــەیی و: *craniate* ۞ پیشوند: جمجمه، جمجمه‌ای و *craniotomy*

**cranial** /ˈkreɪniəl/ *adjective*

(توێکــاری) کەڕاکــەیی، کاژەڵــەیی، ســەربە کەللەســەر یــا کاسەســەر، cephalic ( cranially *adv*) ۞ جمجمه‌ای

**cranial index** *noun,* also cephalic index

ئیندیکسی سەر یان کەڕاکە: پانایی سەر دابەش بەسەر درێژایییەکەی و دواجار لە 100 بدرێ (یان زەرب کرێ) ۞ شاخص جمجمه

**cranial nerve** *noun*

دەماری کەڕاکە یا کاسەی سەر ۞ عصب جمجمه

**craniate** /ˈkreɪniət/ *adjective, noun*

(گیانەوەرناســــی) کەڕاکــــەدار، کاژەڵــــەدار، کاســـەســـەردار؛ گیانـــەوەری کـــەڕاکـــەدار ۞ جمجمه‌دار؛ جانور جمجمه‌دار

**craniography** *noun*

کرانیوگرافی ۞ جمجمه‌نگاری

**craniological** *adjective*

سـەربە کەڕاکەناسی، سـەربە یـان پێـوەنـدی بـە کاژەڵەناسییەوە هەیە ۞ جمجمه‌شناختی

**craniologist** *noun*

کەڕاکەناس، کاژەڵەناس ۞ جمجمه‌شناس

**craniology** /ˌkreɪniˈɒlədʒi/ *noun*

کەڕاکەناسی، کاژەڵەناسی ۞ جمجمه‌شناسی

**craniometric** *adjective*

ســەربە کەڕاکــەپێوی، ســەربە کاژەڵــەپێوی ۞ وابسته به جمجمه‌سنجی

**craniometry** /ˌkreɪniˈɒmɪtri/ *noun*

کەڕاکــەپێوی، کاژەڵــەپێوی، کاسەســەرپێوی ۞ جمجمه‌سنجی

**craniotomy** /ˌkreɪniˈɒtəmi/ *noun, pl.* craniotomies

کاژەڵــەبڕی، کەڕاکەبڕی (= لابردنی بەشێ لە کەڕاکە) ۞ کرانیوتومی

**cranium** /ˈkreɪniəm/ *noun, pl.* craniums or crania /-niə/

کاسەســەر، کاژەڵــە، کەڕاکــە، کــاپۆڵ، کۆجەڵــەی ســەر، سەر ۞ جمجمه

**crank**[1] /kræŋk/ *noun*

1 هەندیل، قۆڵ، باسک، باسکە، میل، کرەنک، دەسک، دەسکەلار، دەسکەتەوەر، لاقە (شێوەی لاقی هەیە) 2 کەسێکی سەیر ۞ 1 هندل، بازو 2 آدم عجیب و غریب

**crank**[2] /kræŋk/ *noun*

1 کەسێکی سەیر 2 پێچدان یان بادانەوەی قسە ۞ 1 آدم عجیب و غریب 2 کرانک

**crank**[3] /kræŋk/ *adjective*

(دەریاوانی و کۆن، کەشتی بادەوەدار) بۆی هەیە وەرگەڕێ ۞ واژگون‌شدنی

**crank-case** *noun*

(میکانیک) کارتێر ۞ کارتر

**cranked** *adjective*

کرەنک، هەندیل، قۆڵدار، قۆڵقۆڵ، باسکدار ۞ هندل، بازودار

**crankshaft** /ˈkræŋkʃɑːft, US -ʃæft/ *noun*

کرەنکشەفت، میلەنگ، لولەکی خولاندنەوە ۞ میل‌لنگ

**cranky** /ˈkræŋki/ *adjective* (crankier, crankiest)
1 سەیر، سەمەرە: *2 cranky ideas/schemes* 2 رووگرژ، مروموچ 3 زووتووڕە، جینگزی، ئالەتی، سەرگەرم 4 داشقەشکاو، کەلاک 5 سست، بێدەوام، وەردەگەڕێ ◌ 1 عجیب و غریب 2 عبوس 3 جوشی 4 ابوقراضه 5 بی‌دوام

**crannied** *adjective*
قەڵەشیو، درزبردوو، کەلەبەردار ◌ شکاف‌دار

**crannog** /ˈkranəg/ *noun*
(سکاتلەند و ئیرلەند) دورگە یا جێگای مانەوەی چکۆلانە لەنێو گۆماو یان زەلکاویدا ◌ کرانوگ

**cranny** /ˈkræni/ *noun, pl.* crannies
1 کەلێن، کون، درز، کەلەبەر، قەڵەش. crevice 2 شوێنی چەپەک یان پەر ◌ 1 سوراخ. شکاف 2 مکان دورافتاده

**crap** /kræp/ *noun*
1 (نافەرمی) گوو، پیسایی 2 هەڵیت‌وپڵیت، قسەی قۆڕ، شرم‌وبرم: *3 He's so full of crap* خراپۆکە، گەنوگووزاڵ، بازاڕی، بێبایەخ، هیچەکە: *This work is complete crap* ◌ 1 گه 2 چرت‌وپرت 3 بنجل، بی‌معنی

**crape** = crepe

**crape fern** *noun*
فێرنێکی درێژی نیوزیلەند [*Leptopteris superba*] ◌ نوعی سرخس

**crape hair** *noun*
(بریتانیا) جۆری پرچ یان مووی دەسکرد کە لە لایەن ئەکتەرانەوە بەکاردێتری، ب.ت. ریش یان سمێڵ ◌ کراپی هیر

**crape myrtle** *noun*, also crepe myrtle
دەوەن یان دارۆچکەیێکی چینی، بە پەڕی چرچی crinkled petal مەیلەو ئەرخەوانی، سپی یان پەمەیی [*Lagerstroemia indica*] ◌ نوعی بوته یا درختچه

**crap game** = craps

**crapper** = toilet

**crappie** *noun, pl.* crappies
کراپی: هەردوو جۆری sunfish گەورەی ناوەندی ئەمریکا [*Pomoxis nigromaculatus* (هی رەش) یان *P. annularis* (هی سپی)] ◌ کراپی

**crappy** /ˈkræpi/ *adjective* (-pier, crappiest)
ئاشاخە، خراپ، رەشۆکی، بازاڕی، ئەیاخ، ئەشغاڵ، بێبایەخ، قۆڕ، هیچ، گەند، ناخۆش: *a crappy novel* ◌ بنجل، آشغال، بی‌ارزش، ناخوشایند

**craps** /kræps/ *noun, pl.*
کراپس (= جۆری قومار بە مۆرە) ◌ کراپس

**crapshoot** = craps

**crapshooter** *noun*
مۆرەهەڵخەر، زارخەر، زارهاوێژ ◌ تاس‌انداز

**crapulence** /ˈkrapjʊləns/ *noun*
1 پیرومەر، گرفت (ئەخۆشیێ لە ئەنجامی زۆر خواردن یان خواردنەوە) 2 زیادەڕۆیی، زیادەرەوی، پەرگیری ◌ 1 کراپیولنس 2 افراط

**crapulent** /ˈkrapjʊl(ə)nt/ *noun, adjective*
زیدەخۆر، زۆرخۆر ◌ پرخور

**crapulous** /ˈkrapjʊləs/ *adjective*
زۆرخۆر لە خواردن و خواردنەوەدا ◌ زیادەرو در طعام و میگساری

**craquelure** /ˈkrakljʊə, US krakˈljʊə/ *noun*
تۆڕەدرز یان قەڵەش (وێنەکێشی یان رەنگ‌کاری) ◌ شبکه‌ی ترک

**crash**[1] /kræʃ/ *noun, adjective*
*n* 1 دەنگی شکان، تەق‌وکوت، تەقەتەق، زرمە، ترپە، هاڕە، شریخە، گرمە 2 لێکدان، پێکدادان، پیاکەوتن 3 وردوخاش‌بوون 4 کەوتنەخوارەوە، بەربوونەوە 5 دابەزین، هاتنەخوارەوە، داشکان *adj* خەست‌وخۆڵ ◌ *n* 1 گرومب، غرش 2 تصادف 3 خردشدگی 4 سقوط 5 تنزل *adj* فشرده

**crash**[2] /kræʃ/ *noun*
کوتاڵ یان پارچەی خاولەیی ◌ کراش

**crash barrier** *noun*
ئەردە، پەرژین، دیوار، لابەستی ریگا (لە قەراخ یان نێوەڕاستی ریگا) ◌ جدول، نرده

**crash course** *noun*
ماوە یا قۆناخی خەست‌وخۆڵ ◌ دوره‌ی فشرده

**crash-dive** *noun*
خۆپیاکردن، خۆلوورکردن، لووربوونی کت‌وپڕ، خۆپیاکردنی بەرگرییانە (ژێردەریایی یان فڕۆکە) ◌ فروشتاب

**crash helmet** *noun*
کڵاوی پاراستن، کڵاوی پاریزە ◌ کلاه ایمنی، کاسکت

**crashing** /ˈkræʃɪŋ/ *adjective*
*a crashing bore* :superlative تەواو، رەبەق، ◌ کامل *a crashing effect* ◊

**crashingly** /kræʃɪŋli/ *adverb*
تەواو، بە تەواوەتی ◌ کاملاً

**crash landing** *noun*
نیشتنەوەی تەنگەتاوی یان ناچاری، بەربوونەوە یان کەوتنەخوارەوەی کۆنترۆڵ‌کراو یان مەهارکراو ◌ فرود اجباری

**crash-test** *noun*, also crash test
تاقی‌کردنەوەی پیاکێشان ◌ تست برخورد

**crasis** /ˈkreɪsɪs/ *noun, pl.* crases /-si:z/
(دەنگ‌ناسی) تێک‌هەڵکێشان، تێکەڵاندن: کورت‌کردنەوەی دوو بزوێنی لێک‌نزیک بۆ دانەیێکی درێژ و دیفتانگی (بنەڕەت: لە *krasis* یۆنانی "mixture") ◌ کراسیس

**crass** /kræs/ *adjective*
1 تەواو، لەئەندازبەدەر، رەبەق، ئازگار 2 کەر،

نەفام، گەوجولەوج، بێڕەوشت، بێماریفەت ◇ 1 صرف، کامل 2 احمق، کودن، بی‌نزاکت

**crassly** /kræsli/ *adverb*

کەرانە، گەوجانە ◇ احمقانه

**crassitude** /'kræsətju:d/ *noun*

کەریتی، گەوجیتی، نەفامی ◇ نفهمی، بی‌شعوری

**crassness** /kræsnəs/ *noun*

کەریتی، گەوجیتی، نەفامی ◇ بی‌شعوری، نفهمی

**-crat** *suffix*

پاشگر: لایەنگر، داکۆکی‌کەر، ئەندام، پشتیوان، پشتگر: *theocrat*، *plutocrat* ◇ پسوند: هوادار، عضو، حامی

**cratch** *noun*

1 (کۆن) ئاخوڕ، ئافر، manger 2 ئاخوری بەیتوللەحم (کە تەیدا لە دایک بوو) 3 کۆمەڵە ئەستێرەیێ بە ناوی "کەن(ـد)ووی هەنگوین" کە لە کانستێلاسیۆن یان گەلەستێرەی قرژاڵ دایە 4 چوارچێوە (ب.ت. بۆ تفاق) ◇ کراچ

**crate** /kreɪt/ *noun*

1 سنووق، سیپ، توولێنە، سەوەتە، قرتاڵە 2 باری سنووقێ، پڕسنووقێ 3 چەپەرەشر، کەلاک، داشقەشکاو (ماشێن) 4 (ئافەرمی) فڕۆکە، تەیارە (crateful n, *pl.* cratefuls) ◇ 1 صندوق، سبد، جعبه 2 مقدار گنجایش یک صندوق 3 ابوقراضه 4 هواپیما

**crater** /'kreɪtə(r)/ *noun*

1 دەم یان زاری گڕکان، کونەگڕکان 2 قوڵکە، چاڵ، کەندەلان (جێی بۆمب، بەردی ئاسمانی یان گوللەتۆپ) 3 کاسەیێکی زلە بۆ تێکەڵکردن یان یان تێکوەردانی مەی لە یۆنانی کۆندا بەکاردێنرا ◇ 1 دهانەی آتشفشان 2 گودال 3 کراتر

**crater lake** *noun*

گۆمی دەم یان کونەگڕکان ◇ دریاچەی دهانەی آتشفشان

**-cratic** *suffix*

پاشگر: ئاوەڵناوساز، سەربە یا پێوەندی بە جۆرێکی تایبەتی حکومەت یا دەسەلاتێکەوە هەیە: *democratic* (بڕوانە -cracy) ◇ پسوند: صفت‌ساز

**craton** /'kratɒn/ *noun*

(زەویناسی) هێزە، ستین: تەختەیێکی جێگیری گەورەی توێکڵی زەوی کە ناوەندی وشکاریێ پێکدێنێ (بنەڕەت: لە *kratos* یۆنانی "strength") ◇ کراتون

**cratonic** *adjective*

(زەویناسی) هێزەیی، پێوەندی بە ستینەوە هەیە ◇ کراتونیک

**cravat** /krə'væt/ *noun*, also ascot

کراڤات، بۆینباخ، ملپێچ، بەندک، کراوات ◇ کراوات

**craven** /'kreɪvn/ *adjective, noun*

*adj* ترسەنۆک، بێغیرەت، حیز، بێجەرگ، بێجەرگانە *n* مرۆی ترسەنۆک ◇ *adj* جبون، بزدل، بزدلانه *n* آدم بزدل

**cravenly** /'kreɪvnli/ *adverb*

بێجەرگانە، حیزانە، لە رووی ترسەوە ◇ بزدلانه

**cravenness** /'kreɪvnnəs/ *noun*

حیزی، بێجەرگی، ترسەنۆکی ◇ بزدلی

**craving** /'kreɪvɪŋ/ *noun*

بەپەرۆشی، تامەزرۆیی، تاسە، ئارەزوو، بێزوو، بێزگ، گز، هەوەس، ئیشتیا، کەڵکەڵە، خولیا، حەز ◇ اشتیاق، عطش، هوس، ولع

**craw** /krɔ:/ *noun*

1 چیکەڵدانە، سیکەتۆرە، کۆلەزرگ، سیکڵدانە (هی باڵندە یان مێروو) 2 کرش، گەدە، عور (گیانەوەران) ◇ 1 چینەدان 2 معده

**crawdad** /'krɔ:dad/ *noun*

crayfishی ئاوی شیرین ◇ کروداد

**crawfish** /'krɔ:fɪʃ/, *pl.* same or crowfish = crayfish

**crawl** /krɔ:l/ *noun*

1 خزیـــــان، خـــــشان، سنگەخـــــشکێ، لەسەرچۆکڕۆیشتن، گاگۆلکێ 2 باسکەمەلە، مەلەباسکە ◇ 1 خزش، سینه‌خیز 2 کرال

**crawler** /'krɔ:lə(r)/ *noun*

خۆڕیخەر، خۆشیرین‌کەر ◇ دست به دستمال

**crawlers** *noun*

بەرگی یەکسەرە (بۆ منال) ◇ لباس سرهمی

**crayfish** /'kreɪfɪʃ/ *noun, pl.* same or crayfishes

کوللەی دەریایی، قرژاڵی درکدار [*Astacus* (ئەورووپا)، *Cambarus* (ئەمریکای باکووری)، و توخمەکانی تر] ◇ خرچنگ خاردار

**crayon** /'kreɪən/ *noun*

1 پێنووسی شەمی یان مۆمی 2 پێنووسی ڕەنگی 3 پێنووس‌گەچ، گەچی ڕەنگی ◇ 1 مداد شمعی 2 مداد رنگی 3 گچ رنگی

**crayonist** *noun*

کرایۆنیست ◇ کرایونیست

**craze** /kreɪz/ *noun*

1 داب، باو 2 کەف‌وکوڵ، تین‌وگوڕ، تین‌وتاو، تاووتین 3 شێتی ◇ 1 مد 2 شور و شوق 3 دیوانگی

**crazed** /kreɪzd/ *adjective*

1 شێت، دەلوو 2 دین، ڕق‌هەستاو، تووڕە، سوورەوەبوو 3 شێتانە: *a crazed look in his eyes* 4 درزاوی، موودار، قەڵەشاوی ◇ 1 دیوانه 2 برآشفته 3 دیوانه‌وار 4 ترک‌دار

**crazily** /'kreɪzɪli/ *adverb*

شێتانە ◇ دیوانه‌وار

**craziness** /kreɪzinəs/ *noun*

شێتی، دەلوویی ◇ دیوانگی، جنون

**crazy** /'kreɪzi/ *adjective* (crazier, craziest),

noun
*adj* 1 شێت، دەلـوو 2 سـوورەوەبوو، تـوورە 3 کـەر، نەفام، گەوجانـە 4 سەوداسـەر، مـردووی، کوشتەی 5 سەیروسەمەرە *n* مرۆی شێت ◌ *adj* 1 دیوانه 2 برافروخته 3 احمق، احمقانه 4 هلاک 5 عجیب و غریب *n* آدم دیوانه
**crazy bone** = funny bone
**crazy paving** *noun*
بەردڕێژی نارێکوپێک ◌ سنگفرش نامنظم
**crazyweed** = locoweed
**C-reactive protein** *noun*
جۆرێ پرۆتئینی نێو سیرۆمی خوێن لە هێندێ دۆخی نائاسایی‌دا (وەک ئاوسان inflammation و neoplasia) ◌ نوعی پروتئین
**creak** /kri:k/ *noun*, also creaking
(دەنـگ) جیرەجیر، جیرە، خرچـە، خرچـەخرچ ◌ جیرجیر
**creakily** /'kri:kıli/ *adverb*
بە جیرەجیر ◌ جیرجیرکنان
**creaky** /'kri:ki/ *adjective* (creakier, creakiest)
1 جیرن، پرلەجیرەجیر، جیرەجیراوی 2 کۆنە 3 لەق، شپرزە، لەرزۆک، رووخـەک: *a creaky economy* ◌ 1 جیری‌جیری 2 قدیمی 3 متزلزل
**cream** /kri:m/ *noun, adjective*
*n* 1 سەرشـیر، توێـشکە، تـوێژ(اڵ)، سـەرتـوێ، قـەیمـاخ: *strawberries and cream* 2 کرێم (دەموچـاو): *hand/moisturizing cream* 3 مەلـهەم، مەرهـەم 4 رەنگی سـپی مەیلەو زەرد: *Do you have this blouse in cream?* 5 هەڵبژاردە، سەرتۆپ، سەرگوڵ، باشترین بەش: *the cream of American society* 6 غوورابی *adj* توێـشکەدار 1 توێـشکەیی 2 سـپی مەیلـەو زەرد، سـپی‌واژ، سـپات، کرێمی ◌ *n* 1 خامـه 2 کرم، پماد 3 رنگ کرمی 4 زبده، بهترین قـسمت 5 بیـسکویت کرم‌دار *adj* 1 خامه‌ای 2 کرم
**cream cheese** *noun*
پەنیری توێـشکەدار، پەنیرەتوێشکە، دەلـەمە ◌ پنیر خامه‌ای
**cream cracker** *noun*
غوورابی یا تۆشەی توێشکەدار ◌ بیسکویت خامه‌ای
**creamcups** *noun*
رووەکێکی ساڵیانە annual و لە خێزانی poppy [*Platystemon californicus*] ◌ نوعی گیاه
**creamer** *noun*
(مێزوویـی) توێـشکەگر، دەزگـای تـوێژگرتن ◌ اسباب خامه‌گیری
**creamery** /'kri:məri/ *noun, pl.* creameries
شـیرەمەنی‌فرۆشـی، (کارگـە) شـیرەمەنی ◌ لبنیات‌فروشی، لبنیات‌سازی
**cream of tartar** *noun*
جـۆرێ خـوێ کریـستاڵی سـپی $C_4H_5KO_6$، ب.ت. لە کردنی گەردە و لە رەعـەمـەڵ هێنانی هێندێ کانزادا بەکاردێترێ ◌ نوعی نمک
**cream puff** *noun*
1 جـۆرێ کـەیـک کـە لـە هـەویـری شـیرینی پـفـهـەڵـدراوی پرسـەرتـوێ دروسـت بـووە 2 (ناڤەرمی) کەسێکی لاواز یان بەکارنەهاتوو، wimp ◌ 1 نوعی کیک 2 آدم ضعیف یا بی‌عرضه
**cream soda** *noun*
جۆرێ خواردنـەوەی نـەرمـی ڤـانیل‌تام، گـازی کاربۆنیکی carbonated تیایە ◌ کرم سودا
**cream tea** *noun*
عەسرۆژە، ئێوارەنان ◌ عصرانه
**creamware** *noun*
گڵێنەی لیاوپۆش glazed بە رەنگی سپی‌واژ یان کرێمی خەست ◌ کرم‌وار
**creamy** /'kri:mi/ *adjective*
1 توێشکەئاسا، سەرشیرئاسـا 2 نەرم 3 چەور 4 سـپی نامـاڵ‌زەرد، سـپی‌واش ◌ 1 خامـه‌ای، خامه‌مانند 2 نرم 3 چرب 4 کرمی
**creance** /'kri:əns/ *noun*
پەتێکی ناسک و درێژ لە لاقی بازی دەبەستن تا لە کاتی فێرکردنا هەڵنەیێ ◌ کرینس
**crease** /kri:s/ *noun*
1 لۆچ، چرچ، چین، گنج، ناوە 2 چرچ‌ولۆچی، زاکاوی (لە پێستدا) 3 قەد، دەق، خەت ◌ 1 چروک 2 چین و چروک 3 تا
**creasy** /kri:si/ *adjective*
1 چرچاوی، لۆچاوی، لۆچ، چرچ، گنجاوی، چین‌دار، چرچ‌ولۆچ، زاکاو 2 دەقاوی، دەق‌دار، قەداوی ◌ 1 دارای چین و چروک 2 تادار
**created** *adjective*
ئـافرێنراو، ئافـەرێـدە، دروسـتکـراو، خوڵـقاو، مەخلووق ◌ مخلوق
**creatine** /'kri:əti:n/ *noun*
(زیندەکیمیا) گۆشتین، کرییتین، کریاتین: مـاک یـان مـادەیێکـی نـایترۆژێن‌داری nitrogenous کریـستاڵی سـپی $C_4H_9N_3O_2$، ب.ت. لـە ماسـوولکەی برببـڕەدارانـدا (بـە شـێوەی فۆسـفۆکراتین phosphocreatine یـان ئـازاد) هەیە (گۆشت + -ine) ◌ کراتین، کریتین
**creatine kinase** *noun*
هـەرێـەک لـە سـێ isoenzyme ی ب.ت. ماسوولکەی دڵ myocardium و ئێسکەپەیکەری برببڕەداران ◌ کراتین
**creatine phosphate** = phosphocreatine
**creatineine** /krı'atıni:n/ *noun*
(زیندەکیمیا) کریاتینین، کراتینین، ئاوێتەیێکی کریـستاڵی سـپی $C_4H_7N_3O$، ب.ت لـە ماسوولکەکان، خوێن و مێزدا هەیە و لە رێگای مێزەوە دەردەدرێ ◌ کراتینین

**creation** /kri'eɪʃn/ *noun*
1 ئافرانـدن، سـازان، خولـقاندن، ئافـەرينـشـت، دروستكردن، سازاندن، دروستبوون، پێكهاتن، هێنانەدی، چێكردن، پێكهێنان، رەخساندن: *the process of database creation* 2 مەخلووقات، ئافەریدەكان، دروسكراوەكان، جەهان، جیهان، گـێتی، دنیـا، بـوون 3 داهێنـان، تازەگـەری 4 بەرهـەمهێنـان 5 (the Creation) دروسبوونی جیهان لە لایەن خوداوە (كتێبی پیرۆز) 6 جیهان و هـەموو ئـەو شـتانەی كـە تیایـا دەژیـن ◇ 1 آفرینش، خلقت، ایجاد 2 كائنات، عالم، گیتی، جهان، هستی 3 ابداع، ابتكار 4 تولید 5 (the Creation) خلقت 6 عالم وجود

**creational** /kri'eɪʃnl/ *adjective*
سەربە دروستبوون، خولـقێنەرانە ◇ آفرینشی، وابسته به خلقت

**creationism** /kri'eɪʃnɪzəm/ *noun*
كریشنباوەری، سازانباوەری (كەسێ كە پێیوایە دنیا بە دەستی خوداوە خولـقاوە و بەو شێوەش كە كتێبی پیرۆز باسی دەكا) ◇ آفرینشگرایی

**creationist** /kri'eɪʃnɪst/ *noun, adjective*
*n* كریشنباوەر، سازانباوەر *adj* كریشنباوەڕانە، سەربە یان پێوەندی بە سازانباوەرییەوە هەیە ◇ *n* آفرینشگرا *adj* آفرینشگرایانه

**creation science** *noun*
زانستی ئافراندن یان ئافەرینشت ◇ علم آفرینش

**creative** /kri'eɪtɪv/ *adjective, noun*
*adj* 1 دروسكـەر، دروسـتكـەر، ئافرێنـەر، سـازێنەر، خولـقێنەر، پێكهێنەر؛ دروستكەرانە، ئافرێنەر، سازێنەرانە، خولـقێنەرانە، پێكهێنەرانە، سـەربـە ئافرانـدن 2 داهێنـەر، تازەگـەر، *the creative arts* ◊ :imaginative داهێنـەر 1 *n company's -tive team* كەسێكی داهێنـەر 2 مایە یان مادە یان بیرۆكە و ئایدیای داهێنەرانە (creatively /kri'eɪtɪvli/ *adv*: داهێنەرانـە؛ creativeness /kri'eɪtɪvnəs/ *n*: داهێنـەریتی، تازەگـەریتی) ◇ *adj* 1 آفریننـده، آفـرینشگـر، آفرینشی 2 خلاق، مبدع *n* 1 آدم خلاق 2 كریتیو

**creative evolution** *noun*
گەشەسەندنی خولـقێنەرانە یان پێكهێنـەرانە ◇ سیر تكامل خالقه

**creativity** /ˌkriːeɪ'tɪvəti/ *noun*
داهێنـەریتی، تازەگـەریتی، داهێنـان؛ توانـایی داهێنـان یـان ئافرانـدن: *Creativity and originality are more important than technical skill* ◇ ابتكار، خلاقیت

**creator** /kri'eɪtə(r)/ *noun*
1 ئافرێنـەر، خولـقێنەر، دروسـتكـەر: *Walt Disney, the creator of Mickey Mouse* 2 (the Creator) خـودا، كردەگـار، كردگـار ◇ 1 خالق 2 آفریدگار

**creatorhood** /kri'eɪtəhʊd/ *noun*
خولـقێنەری، ئافرێنـەری، كردەگـاری، كردگـاری ◇ آفرینندگی

**creatorship** /kri'eɪtəʃɪp/ *noun,* also -orhood
خولـقێنەری، ئافرێنـەری، كردەگـاری، كردگـاری ◇ آفرینندگی

**creature** /'kriːtʃə(r)/ *noun*
1 ئـافرێنراو، ، ئافـەریـدە، دروسكـراو، خولـقاو، مـەخلووق 2 بوونـەوەر، زینـدەوەر: *strange creatures from outer space* 3 گیانـدار، گیانەوەر، گیانلەبەر، جانەوەر 4 بنیادەم، مرۆڤ، كەس 5 نۆكەر ◇ 1 آفریده 2 موجود 3 جـانور 4 انسان 5 دستنشانده

**creature comforts** *noun, pl.*
پێداویستییەكانی (سەرەتایی) ژیـان، كەرەسـەی ئاسایش ◇ مایحتاج

**crèche** /kreʃ/ *noun,* also crib
1 ناوەنـدی چـاودێری منـالان، دایەنگـە 2 پیشـاندانی دیمەنی وێنەی لەدایكبوونی كریست ◇ 1 مهد كودك، پرورشگاه 2 كرچ

**cred** /kred/ = street cred

**credal** /'kriːd(ə)l/ *noun,* also creedal
بـاوەری، بیروبـاوەری، سـەربە بیروبـاوەر ◇ اعتقادی، عقیدتی

**credence** /'kriːdns/ *noun*
1 بـاوەر، بایـەخ، پوێتـە، بـڕوا 2 مێـز یـا قەفەسـەیێكی چكۆلـە، بـۆ هەلـگرتنی شتەكانی شێوی خواوەندی، مێزی نان و مەی ◇ 1 اعتقـاد، اعتبار 2 كردنس

**credentials** /krə'denʃlz/ *noun, pl.*
1 لێوەشـاوەیی 2 باوەڕنامـە 3 بەلـگەنامە (باوەری) ◇ 1 صلاحیت 2 اعتبارنامه 3 مدارك

**credenza** /krɪ'dɛnzə/ *noun*
جێكتێب، قەفـەزەی كتێب، دۆلابی كتێب ◇ قفـەی كتاب

**credibility** /ˌkredə'bɪləti/ *noun*
1 باوەرپێكراوی، لێڕاپینراوی، باوەری، بایەخ 2 سـەراستی، دروستی، راستی ◇ 1 قابلیت قبـول، اعتبار 2 صداقت، صحت

**credibility gap** *noun*
جیاوازی نێوان قسە و كردەوە ◇ فرق بین حرف و عمل

**credible** /'kredəbl/ *adjective*
1 بـاوەرپێكراو، جێـیبەسـند، لـێڕاپینـراو، جێیباوەر، جێیمتمانە، بەبایەخ: *a credible account of an accident* 2 سەرراست، راست، دروست، ژیرانە ◇ 1 قابل قبول، پذیرفتنی، معتبر 2 صادق، معقول

**credibly** /-əbli/ *adverb*
باوەرپێكراوانە، بە شێوەیەكی باوەرپێكراو ◇ بـه طور قابل قبول

**credit** /'kredɪt/ *noun*
1 باوەڕ، بایەخ 2 مۆڵەت، ماوە، دەرفەت، وادە 3 سەرجەم ئەو پارەی کەوا لە حسابی بانکی کەسێ دایە 4 قەرز 5 خاوەنقەرز، قەرزدەر، ستوونی خاوەنقەرز، لای راست 6 لێڕابینین، راپەڕموون 7 شانازی 8 ئابڕوو، ناوبانگ، برەوی، متمانەیی 9 پیاهەڵوتن، پەسندان، ستایشت 10 پەسندکردن 11 مایەی شانازی، جێگای سەربەرزی 12 یەکەی خوێندن (لە کۆلێژ یان زانکۆ) ۞ 1 اعتبار 2 مهلت، مدت 3 موجودی 4 وام 5 بستانکار، ستون بستانکار 6 اعتماد، اطمینان 7 افتخار 8 شهرت، وجهه 9 تمجید 10 تأیید 11 مایەی افتخار 12 واحد درسی

**creditability** /ˌkredɪtə'bɪlətɪ/ *noun*
لەپەسنهاتوویی، اوەڕی، بایەخ، نێوبەدەرەوەیی، ئابڕوو، باوەڕپێکراوی، برەوی، لەپەسندهاتوویی ۞ قابلیت تحسین، اعتبار، شهرت، قابلیت قبول

**creditable** /'kredɪtəbl/ *adjective*
لەپەسنهاتوو، جێیباوەڕ، جێیمتمانە، بەبایەخ، باوەڕپێکراو، جێیپەسند، praiseworthy: *The Green Party won a creditable 16 per cent of the vote* ۞ قابل تحسین، معتبر، قابل قبول

**creditably** /'kredɪtəbli/ *adverb*
بە شێوەیەکی باوەڕپێکراو ۞ به طور قابل قبول

**credit account** = account

**credit bill** *noun*
بیل یان بەراتی باوەڕی ۞ برات اعتباری

**credit card** *noun*
کارتی باوەڕی، کارتی کریدیت، کریدیت کارت ۞ کارت اعتباری

**credit note** *noun*
نامەی باوەڕی، نۆتی باوەڕی (کڕین) ۞ برگەی اعتبار خرید

**creditor** /'kredɪtə(r)/ *noun*
خاوەنقەرز، قەرزدەر ۞ طلبکار

**credit rating** *noun*
هەڵسەنگاندن یان نرخاندنی باوەڕی، رادەی باوەڕی ۞ ارزیابی اعتبار، درجەی اعتبار

**credits** *noun, pl.*
تیتراژ، نێونیشان(ەکان)، ناوەکان ۞ عناوین

**credit side** *noun*
1 لای خاوەنقەرز، لای راست (لە حسابی بانکی) 2 باشی ۞ 1 ستون بستانکار 2 مزیت

**credit squeeze** *noun*
رامیاری کۆنترۆل (دیاریکردن) باوەڕی، سیاسەتی مەهاری باوەڕی ۞ سیاست کنترل اعتبار

**credit-titles** = credits

**credit transaction** *noun*
سەودای بەقەرز یا قەرزی ۞ معاملەی استمهالی

**credit transfer** *noun*
راگوێستن یا گوێزانەوەی باوەڕی ۞ انتقال اعتبار

**credit union** *noun*
کۆمەڵەیێکی هەرەوەزی یان دەزگایێ کە وام و قەرز بە سوودێکی کەم دەدا بە ئەندامانی ۞ کریدیت یونیون

**credit-worthiness** *noun*
جێیباوەڕی، جێی متمانەبوون، قەرزخۆشی، خۆشحیسابی، باوەڕمەندی ۞ اعتبار

**credit-worthy** /'kredɪtwɜ:ði, US -wɜ:rði/ *adjective*
جێیباوەڕ، جێی متمانە، قەرزخۆش، خۆشحیساب، باوەڕمەند ۞ معتبر

**credo** /'kri:dəʊ, 'kreɪdəʊ, US -doʊ/ *noun, pl.* credos
ریباز، بیروباوەڕ، ئارمانج ۞ مرام، مسلک

**credulity** /krɪ'dju:lətɪ, US -'du:-/ *noun*
زووباوەڕی، ساویلکەیی، دڵسافی ۞ خوشباوری، سادەلوحی

**credulous** /'kredjələs, US -dʒə-/ *adjective*
زووباوەڕ، خۆشباوەڕ، ساویلکە، سادە، بێگەرد، بێگرێ، بێفێڵوفەرەج ( credulousness /'kredjələsnəs, US -dʒə-/ *n* ۞ خوش‌باور، سادەلوح

**credulously** /'kredjələsli, US -dʒə-/ *adverb*
ساویلکانە، لە رووی سادەیییەوە، سادە ۞ سادەلوحانە، از روی زودباوری

**Cree** /kri:/ *noun, pl.* same or Crees
1 ئەندامی گەلێکی سوورپێست، لە ناوەندی کەنەدا دەژین 2 زمانی Algonquianی ئەو گەلە (بنەڕەت: کورتەی *Cristinaux* ئالگۆنکویایی) ۞ کری

**creed** /kri:d/ *noun*
ریباز، بیروباوەڕ، باوەڕ، دەزگا یان سیستمی باوەڕی دینی، کۆمەڵە باوەڕێکی بنەڕەتی، ئارمانج: *What is his political creed?* ۞ کیش، آیین، اعتقاد، عقیده

**creedal** = credal

**creedless** *adjective*
بێباوەڕ ۞ بی‌عقیده

**creek** /kri:k/ *noun*
1 لاکەنداو، چۆمەڵە، شەتاو، گەلار، زێ 2 زەلکاو، زۆنگاو 3 کەنداوی چکۆلانە 4 پەلە زەمینێک لە نێوان تەپە و کێودا 5 رێگای پێچەڵاوپێچ ۞ 1 خور، شاخابه، نهر 2 مرداب 3 خلیج کوچک 4 کریک 5 راه پرپیچ‌وخم

**Creek** /kri:k/ *noun, pl.* same or Creeks
1 ئەندامی کۆنفیدراسی گەلانی سوورپێستی باشووری رۆژهەڵاتی ئەمریکا لە سەدەکانی 16 تا 19دا 2 زمانانی Muskogeanی ئەو گەلانە ۞ کریک

**creel** /kri:l/ *noun*
1 قرتالەی ماسی (تیاهەڵگرتن)، سەبەتەماسی 2

تۆڕی راوەماسی 3 میلەیێ بە چەند شیشەوە بۆ راگرتنی ماسوولە یان خلۆکە bobbin لە دەزگای رستن‌دا 3 spinning machine قولاپ، چوارچێوەی قولاپ ◌ 1 سبد ماهی 2 و 3 کربل

**creep** /kri:p/ *noun*

1 کەسێکی سووک و چرووک: *He's a nasty little creep!* 2 خشکان، خشان، خزانی روویی 3 خزەخۆل، خۆلەخزکە، خۆلەخزە (لە داوێنی کێوەوە بەرەو خوارێ دەخزێ) 4 ویرەویر، میروولە(کردنی لەش) ◌ 1 آدم پست و فرمایه 2 خزش 3 لغزش 4 خاک لیز 5 مورمور

**creepage** /kri:pɪdʒ/ *noun*

1 خشان، خشکان، خزیان، خزان 2 پێشکەوتنی بەرەبەرە ◌ 1 خزش 2 پیشرفت تدریجی

**creeper** /'kri:pə(r)/ *noun*

رووەکی پیاهەڵچوو، گیاهەڵچوو یان خشۆک ◌ گیاه رونده

**creeping** /'kri:pɪŋ/ *adjective*

1 خشۆک 2 بەرەبەرە، کەم‌کەم، پلەپلە: *a period of -g inflation* ◌ 1 خزنده 2 تدریجی

**creeping eruption** *noun*

هەڵزلەپانی خشۆک: هێڵێکی سوور لە زیپکەی سەرپێست، ب.ت. لەبەر لارڤا و کرمۆکە (وەک hookworm) کە وەک مشەخۆرێ دەچێتە ژێر پێستی مرۆڤەوە ◌ کریپینگ اراپشن

**creeping Jenny** *noun*

جۆرێ رووەکی خشۆکی تەڕەونە، گەڵاخڕ و گوڵ‌زەرد، لە شوێنی شێ‌دار یان تەڕا دەڕووێ *[Lysimachia nummularia]* ◌ نوعی گیاه

**creeps** *noun*, give someone the creeps

مووبزبوونەوە، قرژبوونەوەی نووک ◌ سیخ‌شدگی مو

**creepy** /'kri:pi/ *adjective* (creepier, creepiest)

1 ترسناک، ترسێنەر، تۆقێنەر: *a creepy horror story* 2 سەیر، سەمەرە، باوەڕپێنەکراو: *What a creepy coincidence* 3 میروولە دێنێ، ویرێنەر (-eepily /'kri:pɪli/ *adv*: ترسێنەرانە، ترسناکانە؛ -piness /'kri:pinəs/ *n*: ترسناکی، تۆقێنەری) ◌ 1 وحشتناک 2 عجیب و غریب 3 مورمورآور

**creepy-crawly** /ˌkri:pi 'krɔ:li/ *adjective, noun* (*pl.* creepy-crawlier)

*adj* ترسناک، هەروەها creepy *n* جوجو، دەعبا (میروو، کرم و هتد) ◌ *adj* وحشتناک *n* کریپی کراولی

**creese** = kris

**cremains** /krɪ'meɪnz/ *noun, pl.*

خۆڵەمێشی مردوو یان تەرمی مردووان ◌ خاکستر اجساد مردگان

**cremaster** /krɪ'mastə/ *noun*

1 (میرووناسی) نووکێکی قولاپ‌ئاسای قوزاخەی پەپوولە pupa 2 butterfly (تویکاری) ماسوولکەی spermatic cord ◌ کریماستر

**cremation** /krə'meɪʃn/ *noun*

سووتاندن، ئاورتێبەردان (تەرم)، مردەسووتێنی، مردەسووتمان (*n* cremator: سووتێنەر) ◌ مردەسوزان

**crematorium** /ˌkremə'tɔ:riəm/ *noun*, also crematory /'krɛmət(ə)ri/, *pl.* crematoria or crematoriums

کوورەی لەش‌سووتاندن، ئاگرخانە، خانووبەرە یان شوێنی سووتاندنی (تەرمی) مردووان، سووتانگەی تەرمی مردووان ◌ مردەسوزگاه

**crematory** /'krɛmət(ə)ri/ *adjective, noun*

= (*pl.* crematories) *n* cremation سەربە *adj* North American term for crematorium ◌ کریماتوری

**crème de cas'sis** /ˌkrɛm də ka'si:s/ = cassis

**crème de la crème** /ˌkrem də lɑ: 'krem, French kʀɛm də la kʀɛm/ *noun*

(کەس یان شتێ) باش‌ترین، سەرتۆپ، سەرتل، هەڵبژاردە: *This school takes only the crème de la crème* ◌ (آدم یا چیزی) بهترین، نخبه‌ترین، سرآمد

**crème de menthe** /ˌkrem də 'mɒnθ, US 'menθ/ *noun*

لیکۆری نەعنا یان جاترە (بنەڕەت: فەرەنسی "cream of mint") ◌ لیکور نعنا

**crenate** /'kri:neɪt/ *adjective*, also crenated

(رووەک‌ناسی و گیانەوەرناسی) ددانەددانە، قەڵبەدار، گرنج‌گرنج، برگەبرگە، کۆنگرەدار، دابڕدابڕ: *a crenate leaf* ◌ مضرس، کنگره‌دار

**crenation** /kri:'neɪʃn/ *noun*

ددانەداری، ددانەددانەیی، گرنج گرنجی، برگەبرگە، کۆنگرە ◌ تضرس، کنگره

**crenel** /'krenl/ *noun*, also crenelle /krə'nel/

کونەشوورە، کون، تیرگە، کولانکە ◌ مزغل

**crenellated** *adjective*

شوورەدار ◌ مجهز به برج و بارو

**crenulation** *noun*

1 ددانەداری، گرنج‌گرنج‌بوون، دابڕدابڕبوون، برگەبرگەیی(بوون) 2 (crenulations) کۆنگرە، کونگرە، شوورە، قەڵبە، برگەدیوار ◌ 1 تضرس، کنگره‌داربودن 2 (در جمع) کنگره، برج و بارو

**creodont** /'kri:ədɒnt/ *noun*

د(د)ان‌گۆشت، دان‌گۆشتینە: گیانەوەرێکی گۆشت‌خۆری بووبەردی fossil سەرەتا(کان)ی سەردەمی Tertiary، گۆشت‌خۆرەکانی ئێستا لە رەچەڵەکی ئەون (بنەڕەت: لە *Creodonta*

لاتینی نوێ (ناوی ده‌سته‌ی order)؛ بنه‌ڕه‌ت: له یوونانی *kreas* "گۆشت" + *odont-* ,*odous* "ددان") ◌ کریودونت

**Creole** /'kri:əʊl, US -oʊl/ *noun, adjective,* also creole

*n* 1 زمانی کریۆل 2 به‌ره‌چه‌له‌ک ئه‌ورووپایی له هیندی ڕۆژاوا یان ئه‌مریکای سپانیایی‌دا 3 دووره‌گه‌ی ئه‌فریقایی-ئه‌ورووپایی 4 کریۆل‌زمان *adj* سه‌ربه کریۆل ◌ *n* 1 زبان کریول 2 کریول 3 دورگه‌ی افریقایی–اروپایی 4 کریول‌زبان *adj* وابسته به کریول

**creolization** /kri:ə(ʊ)lʌɪ'zeɪʃ(ə)n/ *noun*

وه‌رگێران بۆ کریۆلی ◌ ترجمه به کریولی

**Creon** *noun*

کریۆن: پادشای ئه‌فسانه‌یی تێب یان تێبێس Thebes، برای ژۆکاستا Jocasta و جێنشینی ئۆدیپوس Oedipus ◌ کرئون، کریون

**creosol** /'kri:əsɒl/ *noun*

(کیمیا) کریۆسۆل: شله‌یێکی بێ‌ڕه‌نگ که پێکهێنه‌ری سه‌ره‌کی کریۆسۆتی قیری داره wood tar ◌ کریوسول

**creosote** /'kri:əsəʊt, US -soʊt/ *noun*

1 ڕۆنه‌خه‌ڵووز 2 ڕۆنی قه‌تران، جه‌وهه‌ری قیر 3 = creosote bush ◌ 1 کرزوت 2 جوهر قیر

**creosote bush** *noun*

جۆرێ ده‌وه‌نی ئاسایی هی ناوچه بێ‌بارانه‌کانی مێکسیک و ڕۆژاوای ئه‌مریکا [*Larrea tridentata*] ◌ نوعی درختچه

**crepe** /'kreɪp/ *noun,* also crape

1 کرێپ (پارچه) 2 کرێپ (جۆرێ جیر زۆرتر بنه‌که‌وشی لێ‌دروس ده‌که‌ن) 3 به‌رگی ماتەم ◌ 1 کرپ (پارچه) 2 کرپ 3 لباس عزا

**crepe de China** /də 'ʃi:n/ *noun*

کرێپی چینی ◌ کرپ‌دوشین

**crepe myrtle** = crape myrtle

**crepe paper** *noun*

کاغزی چرچ یان لۆچاوی، کاغزی جیری ◌ کاغذ چروک

**crepe rubber** *noun*

کرێپ (= جۆرێ جیر زۆرتر بنه‌که‌وشی لێ‌دروس ده‌که‌ن) ◌ کرپ

**crepitant** /'krepətənt/ *adjective*

شریخن، شریخێنه‌ر، قرچن، ته‌قه‌ته‌قکه‌ر، قرچێنه‌ر، شه‌قشه‌قه، شه‌قه‌شه‌قکه‌ر ◌ ترق‌وتوروق‌کننده

**crepitation** /ˌkrepɪ'teɪʃn/ *noun*

شریخه‌شریخ، قرچه‌قرچ، ته‌قه‌ته‌ق، قرچ‌وهۆڕ، شه‌قه‌شه‌ق، شه‌ق‌وهۆڕ ◌ ترق‌وتوروق

**crepitus** /'krɛpɪtəs/ *noun*

(پزشکی) کرته، خرە، خرمه، شه‌قه ◌ کرپیتوس

**crépon** /'kreɪpɒn/ *noun*

کوتاڵێ له شێوه‌ی کرێپ ◌ کرپون

**crept** /krept/ = past and past participle of creep

**crepuscle** /krɪ'pʌskl/ *noun,* also crepuscule

به‌ره‌بەیان، که‌ره‌به‌یانی، مه‌لابانگدان، کازوکووزی به‌یانی، کازیوه، هه‌وه‌ڵی ڕۆژێ، تاریکوروون، بوولێڵه، تاریکان، نارۆشن (بۆ هه‌ردووکیان)، دره‌نگان، زه‌رده‌په‌ڕ ◌ فلق، شفق

**crepuscular** /krɪ'pʌskjələ(r)/ *adjective*

به‌ره‌به‌یانی، تاریکورروونی، که‌ره‌به‌یانی، بوولێڵه‌یی، شه‌وه‌کی، تاریکان، زه‌رده‌په‌ڕ، نارۆشنی: *-scular light* ◌ بامدادان، شامگاهان

**crescendo** /krə'ʃendəʊ, US -doʊ/ *adjective, noun*

*adj, adv* (موسیقا) ڕووله‌سه‌ر، ڕووه‌وسه‌ر *n* (ئاستی ده‌نگ) *pl.* crescendos or crescendi /-di/) زۆربوونی به‌ره‌به‌ره‌یی ◌ *adj, adv* اوج‌گیرنده *n* افزایش تدریجی

**crescent** /'kresnt, US 'kreznt/ *noun, adjective*

*n* 1 مانگی یه‌کشه‌وه، نوێ‌مانگ، هه‌یڤک، مانگیله، داسی مانگ 2 (شه‌قام یان ڕیزه‌ماڵێ) نیوبازنه، ده‌مه‌داسی، که‌وانه‌یی 3 (the Crescent) دروشم یان نیشانه‌ی ده‌وڵه‌تی عوسمانی *adj* 1 مانگیله‌یی 2 ڕووله‌په‌ره، گه‌وره‌بوو، ڕووله‌زۆری، په‌ره‌سه‌ندوو، increasing ◌ *n* 1 هلال 2 نیم فلکه 3 علامت دولت عثمانی *adj* 1 هلالی 2 افزاینده، رو به رشد

**the Crescent** /'kresnt, US 'kreznt/ *noun*

هێما یان نیشانه‌ی ئیسلام ◌ نماد اسلام

**crescive** /'kresiv/ *adjective*

گه‌شنده، ڕووله‌گه‌شه، گه‌وره‌وه‌بوو، ڕووله‌زۆری، په‌ره‌ئه‌ستێن (crescively /'kresivli/ *adv*) ◌ نامی، بزرگ‌شونده، زیادشونده

**cresol** /'kri:sɒl/ *noun*

(کیمیا) کریسۆل (شله یان ڕۆنێ که له قه‌تران ده‌گیرێ) ◌ کریسول

**cress** /kres/ *noun*

(ڕووه‌کناسی) ته‌ره‌تیزه، ته‌ره‌تووره، ته‌ره‌تووله، تووزک، کووزه‌ڵه، تویزه‌ڵه [*Barbarea* و تۆخمه‌کانی تر] ◌ شاهی، تره‌تیزک، بولاغ اوتی

**cresset** /'krɛsɪt/ *noun*

(مێژوویی) چرا، مه‌شخه‌ڵ، قه‌ندیل ◌ مشعل، قندیل

**Cressida** *noun*

کریسیدا: ژنێکی ترۆجانی (یا ترۆیی) که به‌پێی ئه‌فسانه‌کانی سه‌ده‌کانی نێوه‌ڕاست سه‌باره‌ت به گراوه‌که‌ی Troilus بێ‌وه‌فایی ده‌کا ◌ کرسیدا

**crest** /krest/ *noun*

1 کاکۆڵ، پۆپنه، پۆپ، تاج، کڵاوه، پۆپکه، پۆته‌ڵاک، پۆپه 2 په‌ڕکڵاو، جوقه 3 یاڵ 4 نووک، سه‌رنووچکه، سه‌رکه‌ل، دوند، دهار،

تەوق، کمت، ترۆپک، لووتکە 5 نیشانە، ئارم، مۆر، دروشم 6 ریز، هێڵ 7 (تویکاری) تیغە، قیتکە یان دەرپەڕیوی سەر ئێسک ۞ 1 کاکل 2 جقە 3 یال 4 قلە، نوک، اوج 5 آرم 6 ردیف، خط 7 کرست

**crested** /ˈkrestɪd/ *adjective*

1 پۆپن، کاکوڵدار، پۆپەدار، تاجدار، پۆپنە: *a - crested bird* 2 نیشاندار، دروشماوی، نیشانەدار: *crested notepaper* ۞ 1 کاکل‌دار 2 دارای آرم

**crested wheatgrass** *noun*

گیایێکی تفاق، رەسەنی ئۆراسیا [*Agropyron cristatum*] ۞ نوعی گیاه

**crested wren** *noun*

(باڵندەناسی) مووتە ۞ کرستید ورن

**crestfallen** /ˈkrestfɔːlən/ *adjective*

دڵسارد، وەڕەز، جاڕز، نارەحەت، عاجز، بێزراو، دڵتەنگ، لێوبەبار، خەمبار (**crestfallenly** *adv*; **crestfallenness** *n*) ۞ مأیوس، دمغ، پکر، افسرده

**crestfish** *noun, pl.* same of crestfishes

ماسیەپۆپنە [*Lophotus lacepedei*] ۞ نوعی ماهی

**cresting** *noun*

نەخش یان رازاندنەوەی پۆپنەیی یان تاجی ۞ آذین کاکلی

**cresyl** /ˈkriːsʌɪl, US -sɪl/ *noun*

(کیمیا، وەک ئاوەڵناو) کریسیل ۞ کریسیل

**cresylic** *adjective*

کریسۆلی ۞ کریسولی

**cretaceous** /krɪˈteɪʃəs/ *adjective*

قسلی، کلسی، ئاهەکی، سەربە کلس، کلس‌ئاسا، قسڵ‌ئاسا ۞ وابسته به آهک، آهکی، آهک‌مانند

**Cretaceous** /krɪˈteɪʃəs/ *adjective*

(زەویناسی) کریتێیشیس، گەچینە، کریتاسە (ئاماژە دەکا یان سەربە دوایین سەردەم لە سەردەمانی Mesozoic era (نێوان ژوراسیک Jurassic و تێرشیاری Teritiary، دەوروبەری 146 تا 65 ملیۆن ساڵ لەوەپێش)، سەروبەندێ کە یەکەمین رووەک و گیای گوڵدەرکەر دەرکەوتن و لە کۆتاییدا دایناسۆرەکان، ammonite ـەکان، و زۆر جۆری تری زیندەوەر و ئۆرگانیزمەکان تیاچوون (بنەڕەت: لە لاتینەوە cretaceus (تەویش لە creta "گەچ "chalk) + -ous) ۞ کرتاسه

**cretaceous period** *noun*

(زەویناسی) سەردەمی کریتاسە یان گەچینە ۞ دورەی کرتاسه

**cretaceous system** *noun*

(زەویناسی) ریکخستەی کریتاسە یان گەچینە ۞ نظام کرتاسه

**Cretan** /ˈkriːtən/ *noun, adjective*

*n* دانیشتوو یان رەسەنی دورگەی یۆنانی Crete *adj* سەربە کریت یا خەڵکەکەی، کریتی ۞ کرتی

**cretin** /ˈkretɪn, US ˈkriːtn/ *noun*

1 کریتین، کورتەبالا، گڕگن (لەگەڵ دواکەوتوویی) 2 (نافەرمی) کەر، گەوج: *Why did you do that, you -n?* ۞ 1 کرتن 2 احمق

**cretinism** *noun*

کریتینیزم، کورتەبالایی، گڕگنی، بالابەستی ۞ کرتینیسم

**cretinous** /ˈkretɪnəs, US ˈkriːtnəs/ *adjective*

(نافەرمی) کەر، گەوج ۞ احمق

**cretonne** /krɛˈtɒn, US ˈkrɛtɒn/ *noun*

کریتان، کەتانی ئەستوور، پارچەی پەردەیی ۞ کریتون

**Creutzfeldt-Jakob disease**

/ˌkrɔɪtsfɛltˈjakɒb/ *noun*, also (CJD)

سیجیدی (= نەخۆشییێ کە تووشی مێشک دەبێ و دەبێتەهۆی نەمانی کۆنترۆڵ و هۆش و جەستە و لە ئەنجامدا مردن؛ بنەڕەت: لە ناوی دەمارناسی ئەڵمانی H. G. *Creutzfeldt* و A. *Jakob*، مەرگ 1931) ۞ سی‌جی‌دی

**crevasse** /krəˈvæs/ *noun*

1 کەلێن یان کەلەبەری قووڵ، قووڵەکەلێن، قووڵەقەڵەش 2 سەهۆڵەکەلێن، قەڵەشەسەهۆڵ، کەلێنەسەهۆڵ، کەلێنی سەهۆڵ (لە *crevice* فەرەنسی کۆن، بڕوانە crevice) ۞ 1 شکاف عمیق 2 شکاف یخی

**crevice** /ˈkrevɪs/ *noun*

کەلێن، کەلەبەر، کەلشی، قلیش، درز، زەنگ ۞ شکاف، ترک

**crew** /kruː/ *noun*

1 کارکەران، دەستەی کارکەران (فڕۆکەوانی و کەشتیەوانی) 2 کۆمەڵە، دەستە، گرووپ، تیپ 3 دارودەستە ۞ 1 خدمه 2 تیم، گروه 3 باند

**crew** = past of crow

**crew cut** *noun*

سەری تاشراو، موو یا قژی کورتەوەبوو (شێوازێ بۆ پیاوان) ۞ موی کوتاه

**crewel** /ˈkruːəl/ *noun*

بەن یان ریس بۆ قولاپچنی، بەنی میلچنی ۞ نخ قلاب‌دوزی

**crewman** /ˈkruːmən/ *noun, pl.* crewmen

ئەندامی کارکەران ب.ت. پیاو (کەشتی یان فڕۆکە) ۞ عضو خدمه

**crew neck** *noun*

ملیوان خڕ، یەخەی خڕ (بۆلۆڤێر یان بلووزی خوری) ۞ یقەی گرد

**crew-necked** *adjective*

ملیوانخڕ، یەخەخڕ ۞ دارای یقەی گرد

**crib** /krɪb/ *noun*, also cribbage

1 ئاخوڕ، ئافر (manger) 2 کۆختە 3 سەوەتە،

زەمیلە، قرتالە، توولـینە 4 عەماری خوێ و دەغڵ(ودان) 5 (تاقی‌کاری) گزی‌کاری، گزەونی 6 بەرهەمدزی، دزی ویژەیی، plagiarism؛ وردەدزی، خوێڕیەدزی، دەڵەدزی، سیرمەدزی 7 تەخت(خەو)ی منداڵ 8 مـودێلی دیمەنی لەدایکبوونی مەسیح، کە لە کریسمەس‌دا لە ماڵان یان کڵێسەکان‌دا دادەنرێ 9 = کورتە ی cribbage 10 پەرە لادانراو یان فڕێدراوەکان 11 (هەروەها cribwork) چوارچێوەیێکی قورسی لە تەختە کە بۆ فونداسیۆن و بنەرەتەکان بەکاردێنرێ 12 بەربەست یان بەنداوێکی چۆمی بۆ کەم‌کردنەوەی ڕوێینی ئاو یان شوێنی هەڵگرتنەوەی کۆتەرە سواراوەکان (ئەڵمانی بنەرەت) ○ 1 آخور 2 کلبە 3 سبد 4 کریب 5 تقلب 6 سرقت ادبی؛ دلەدزدی 7 تخت‌خواب کودک 8، 9، 10، 11 و 12 کریب

**cribbage** /ˈkrɪbɪdʒ/ *noun*

کریباژ (= جۆرێ پەڕێنی دوو کەسە، هەریەک 6 پەڕ هەڵدەگرن) ○ کریباژ

**cribbing** *noun*

1 ماکی سازکردنی crib 2 (هەروەها crib-biting) جۆرێ بەدخوویی هێندێ ئەسپ کە قەپ لە شتی ڕەق دەگرێ (وەک دار لە تەویلە) ○ کریبینگ

**crib death** = cot death

**cribellate** *adjective*

بێژنگیلەدار، خاوەن بێژنگیلە ○ دارای کریبلوم

**cribellum** /krɪˈbɛləm/ *noun, pl.* cribella /-lə/

(گیانەوەرناسی، لە هێندێ جاڵجاڵۆکەدا) بێژنگیلە (بنەرەت: لە لاتینی late ـەوە، چکۆلێنراوی *cribrum* "بێژنگ "sieve) ○ کریبلوم

**cribo** /ˈkriːbəʊ, US ˈkrʌɪbəʊ/ = indigo snake

**cribriform** /ˈkrɪbrɪfɔːm/ *adjective,* also cribrous

(توێکاری) بێژنگ‌ئاسا، دابێژراو، کون‌کون، بێژنگی ○ سوراخ‌سوراخ

**cricetid** *noun*

هەر کرتینەرێکی خێزانی Cricetidae کە hamster، gerbil، جرج و مشەکانی جیهانی نوێ، lemming و vole کان دەگرێتەوە ○ کریستید

**crick** /krɪk/ *noun*

داگیران، گیران، کۆڵنج، بەگیرویستان، ملێشە (شان و مل و پشت) ○ گرفتگی

**cricket**[1] /ˈkrɪkɪt/ *noun*

(یاری) کریکێت، جۆرێ گۆیێن ○ کریکت

**cricket**[2] /ˈkrɪkɪt/ *noun*

1 سیسرک، جرجرو، جرجرکە، ڕوولک [خێزان Gryllidae: زۆر جۆرن] 2 بۆ ناوی ئەو مێرووانەی تر بەکاردێنرێ کە پێوەندی‌یان بەو خێزانەوە هەیە، ب.ن. bush cricket ○ جیرجیرک

**cricketer** /ˈkrɪkɪtə(r)/ *noun*

کریکێت‌زان، یاریزانی کریکێت، کریکێت‌باز ○ بازیکن کریکت

**cricketing** /ˈkrɪkɪtɪŋ/ *noun*

کریکێتێن، کریکێت‌کردن، کریکێت‌بازی ○ کریکت‌بازی

**cricoid** /ˈkrʌɪkɔɪd/ *noun,* also cricoid cartilage

(توێکاری) کرۆژەی بازنەئاسای قوڕگ ○ حلقوی

**cri de cœur** /ˌkriː də ˈkəː, French kʀi də kʀ/ *noun*

1 داخوازی یان سکاڵای بە سۆزەوە 2 کوڵ (یان کلپە)ی گریان، گریان لە دڵەوە (لە فەرەنسەوە "cry from the heart") ○ کری دوکور

**cried** = past and past participle of cry

**crier** /ˈkraɪə(r)/ = town crier

**crikey** /ˈkraɪki/ *interjection*

(بریتانیا و نافەرمی) تەح، پیاح، ماشەڵڵا (جوان‌دەربڕی Christ) ○ عجب

**crim** = criminal

**crime** /kraɪm/ *noun, adjective*

*n* 1 تاوان 2 گوناه، سووچ، هەڵە، چەوتی، شاشی *adj* تاوانی، تاوانکارانە، تاوانکاری‌یانە ○ *n* 1 جرم 2 گناه، خطا، اشتباه *adj* جنایی

**Crimean** /krʌɪˈmiːən/ *adjective*

کرێمیەئی، سەربە Cremea، نیمچەدوورگەیێکی ئۆکراین، نێوان دەریای ئازۆف Azov و دەریای ڕەش ○ کریمەای

**crime fiction** *noun*

داستان یان زانستەچیرۆکی تاوانکاری‌یانە ○ داستان جنایی

**crime wave** *noun*

شەپۆل یان لێشاوی تاوانکاری ○ موج جنایت

**criminal** /ˈkrɪmɪnl/ *noun, adjective*

*n* 1 تاوانکار، گوناهکار، خراپەکار، خەتابار 2 هەڵەی ئاکاری، کردەوەی دژی ئاکار *adj* 1 پێچەوانەی ئاکار یان قانوون، شەرماوی، ناڕەوا 2 تاوانکاری‌یانە، سزایی (criminally /ˈkrɪmɪnəli/ *adv*: تاوانکارانە، گوناهکارانە) ○ *n* 1 مجرم، بزهکار، جنایتکار 2 خطای اخلاقی *adj* 1 خلاف اخلاق یا قانون 2 کیفری، جزایی، جنایی

**criminal code** *noun*

قانوونی سزا یان تاوانکاری‌یانە ○ قانون کیفری

**criminal conversation** *noun*

(ماف) زینا(کاری) ○ زنا

**criminal court** *noun*

دادگای تاوانکاری‌یانە یان تاوانکاری ○ دادگاه کیفری

**criminality** /ˌkrɪmɪˈnæləti/ *noun*
1 تاوانکاری، گوناهکاری، تاوانباریتی 2 گوناهـ کردن، تاوانکردن، تووشی گوناهـ یان تاوان بوون 3 تاوان، گوناهـ ◌ 1 بزهکاری، مجرمیت 2 ارتکاب جرم 3 جرم

**criminalization** /ˌkrɪmɪnəlaɪˈzeɪʃn, US -ləˈz-/ *noun*
کریمانالیزهیشین، کردنی شتێکی ناقانوونی بە تێپەڕاندنی بە قانوونێکی نوێ ◌ کریمانالیزاسیون

**criminal law** *noun*
1 قانوونی تاوانکاری، قانوون یان زاگۆنی سزا 2 مافەکانی سزا ◌ 1 قانون کیفری 2 حقوق جنایی

**criminal lawyer** *noun*
قانوونزان یان پارێزەری تاوانکاری(یانە) ◌ وکیل جنایی

**criminal record** *noun*
پێشینە یان رابردەی تاوانکاری(یانە) ◌ سوابق جنایی

**crimination** /ˌkrɪmɪˈneɪʃn/ *noun*
تاوانبارکراوی، گوناهبارکراوی ◌ اتهام به جنایت

**criminogenic** /ˌkrɪmɪnəˈdʒenɪk/ *adjective*
بۆی هەیە ببێتە مایەی جوولانەوەیێکی تاوانکارانە ◌ کریمینوژنیک

**criminological** /ˌkrɪmɪnəˈlɒdʒɪkl, US -ˈlɑːdʒ-/ *adjective*
تاوانناسییانە، سەربە تاوانناسی (criminologically *adv*) ◌ جرمشناختی

**criminologist** /-dʒɪst/ *noun*
تاوانناس ◌ جرمشناس

**criminology** /ˌkrɪmɪˈnɒlədʒi, US -ˈnɑːl-/ *noun*
تاوانناسی، گوناهناسی؟ ◌ جرمشناسی

**crimp** /krɪmp/ *noun, adjective*
*n* 1 بەرگرتن، پێشگیری، رێلێگرتن 2 چین، قەد 3 فر یا لوول(کراو، قژ) *adj* قەدقەد، چیندار، چینچین (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ *n* 1 جلوگیری 2 چین 3 تاب *adj* چیندار

**crimped** *adjective*
1 قەدقەد، گنجگنج، چینتێکەوتوو، چرچتێکەوتوو، لۆچاوی، گنجاوی 2 فر یان لوول(کراو، قژ) ◌ 1 چینخورده 2 فردار

**crimper** *noun*
(نافەرمی) سەلمانی، جوانکار ◌ آرایشگر

**Crimplene** /ˈkrɪmpliːn/ *noun*
کریمپلین (ریشاڵ یان پارچەیەکی چرچنەبوو) ◌ کریمپلین

**crimpy** *adjective*
(موو) فر، لوول ◌ مجعد، تابدار

**crimson** /ˈkrɪmzn/ *noun, adjective*
(رەنگ) زرشکی، ئەرخەوانی، رەنگی خوێنی، سووری توخ، سووری توند (بنەڕەت: لەسەر بنچینەی *kirmizī* عەرەبییەوە) ◌ زرشکی

**cringe** /krɪn(d)ʒ/ *noun*
زمانلووسی، کلکەسووتێ، مەرایی ◌ چاپلوسی

**cringle** *noun*
ئالقە یان قوڵفەی تەناف (بۆ تەنافەکانی تر تا پیاتێپەڕن) ◌ کرینگل

**crinkle** /ˈkrɪŋkl/ *noun*
چرچ، لۆچ، قەد، لوولی، چین، گنج ◌ چروک

**crinkled** *adjective*
چرچ، لۆچاوی، گنجگنج، لووللوول، چینتێکەوتوو، گنجتێکەوتوو، قرچۆک، قرچۆڵ ◌ چروکیده

**crinkles** *noun*
چین، قەد، چرچولۆچی ◌ چین، چروک

**crinkly** /ˈkrɪŋkli/ *adjective*
1 چرچاوی، چرچولۆچ، گنجولۆچ، لۆچاوی 2 لوول (قژ) ◌ 1 دارای چین و چروک 2 مجعد

**crinoid** /ˈkrɪnɔɪd, US ˈkraɪnɔɪd/ *noun*
(گیانەوەرناسی) زەمبەقە، زەمبەقی، پسوول (Crinoidea) ◌ سوسنی

**crinoidal** /-ˈnɔɪd(ə)l/ *adjective*
زەمبەقە، زەمبەقئاسا، زەمبەقی ◌ سوسنی

**crinoline** /ˈkrɪnəlɪn/ *noun*
کرینۆلین، داوێنی هەڵماو ◌ کرینُلین

**criollo** /krɪˈɒləʊ, US -ɒljəʊ/ *noun*, also Criollo, *pl.* criollos
1 کەسێکی سپانیایی ئەمریکای ناوەندی و باشووری، ب.ت. لە نژادێکی رەسەنی سپانیایی 2 (هەروەها criollo tree) جۆرێ داری cacao ◌ کریالو

**criosphinx** *noun*
سفینکس یان ئەبولهەولی سەربەران ◌ ابوالهول قوچسر

**cripple** /ˈkrɪpl/ *noun*
(کەسێکی) پەککەوتە، فەلەج، کەفتەکار، جۆنگ، شەل، لەنگ، گۆج، لەسم، سەقەت، کۆڵ، شەلوکوێر ◌ (آدم) علیل، معلول، فلج، چلاق

**crippled** *adjective*
پەککەوتە، مجرۆ، جۆنگ، کۆچیل، شەل، لەنگ، گۆج، لەسم، سەقەت، کۆڵ، گێر، شەلوگێر ◌ علیل، معلول، فلج، چلاق

**crippling** *adjective*
لەسمێنەر، فەلەجکەر، لەکارخەر، پەکخەر، سەقەتکەر، جۆنگکەر ◌ فلج‌کننده

**crises** /-siːz/ = plural form of crisis

**crisis** /ˈkraɪsɪs/ *noun, adjective, pl.* crises /-siːz/
*n* 1 قەیران، تەنگژە، ئاریشە، تەنگوچەڵەمە: *a political crisis* ◊ *financial risis* ◊ *the government's latest economic crisis* 2 توندایی یا سەختایی نەخۆشی، ئاگا: *The fever*

*adj has passed its crisis* تـەنگژەیی، قـەیرانی، سەربە قـەیران ◊ *n* 1 بحران 2 اوج بیمـاری *adj* بحرانی

**crisp**[1] /krɪsp/ *adjective* (crisper, crispest)
1 چـیـن‌دار، ئوتـوکراو، قـەدکراو، دەق‌دراو: *a crisp white shirt* 2 ناسک، قرپ، قرچ، تورت، وشک 3 برژاو 4 تازە، تەڕوتازە (میوە و سەوزە) 5 کورتـە 6 سـارد و وشـک (هـەوا): *a crisp winter morning* 7 بڕا، شێلگیر، بەبڕشت، پتەو، یەکلاییکـەرەوە 8 (قژ) فر، لـوول 9 (وێنـە یـان پلانی) شەق، روون، دیار، ئاشکرا ◊ 1 اتوکشیده 2 ترد، خشک 3 برشته 4 تازه 5 مختصر 6 سـرد و خشک 7 قاطع، محکم 8 فرفری 9 واضح، آشکار

**crisp**[2] /krɪsp/ *noun*
کریسپ، قاشە پەتاتەی سوورەوەکراو ◊ چیپس

**crispated** *adjective*
چـین‌چـین، چـرچولـۆچ، چـرچ، لـۆچ، لـوول ◊ چین‌دار، متجعد

**crispation** /krɪsˈpeɪʃn/ *noun*
چرچولۆچی، چالـیوچۆلـی، پێچـاوپێچی، خـوز، بۆت، پێچ، قەف، چرچی، لۆچی، قرچۆلی، کرژی، هەڵقرچان، کرژبوون، لوولی ◊ تجعد، انقباض

**crispbread** *noun*
جۆرێ تۆشەی تورت لە چـەودان یـان گـەنم ◊ نوعی بیسکویت

**crisply** /krɪspli/ *adverb*
1 بـە شـێوەیەکی بڕا یـان یـەکلاییکـەرەوە 2 بـە شـێوەیەکی کـورت: *crisply fried potatoes* ◊ 1 به طور قاطع 2 به طور موجز

**crispness** /ˈkrɪspnəs/ *noun*
1 تـەز، سـەرما 2 کـورتی، پـوختی 3 وشـکی، ناسکی، قرپی، قرچی، تورتی: *The salad had lost its crispness* ◊ 1 سوز 2 اختصار 3 تردی

**crispy** /ˈkrɪspi/ = crisp

**crisscross**[1] /ˈkrɪs krɒs, US krɔːs/ *adjective, adverb, noun*
*adj* یەکتربڕ، هاوبڕ، چـەپوڕاستی، خـاچواری، یەکبڕ: *a crisscross pattern* *adv* بەشێوەیەکی یەکتربـڕ، هاوبڕانـە *n* هێـڵە چـەپوڕاسـت یـان یەکتربـڕەکان، نەخـشی چـەپوڕاسـتی: *a crisscross of streets* ◊ *adj* متقاطع، ضرب‌دری *adv* به طور متقاطع *n* خطوط متقاطع، طرح متقاطع

**crisscross**[2] /ˈkrɪs krɒs, US krɔːs/ *noun*
تۆڕ ◊ شبکه

**crista** /ˈkrɪstə/ *noun, pl.* cristae /-tiː/
(گیانەوەرناسـی، توێکـاری) پۆپـە، کریـستا (بنـەڕەت: لە لاتینـەوە بـە واتـای "plume, tuft, crest") ◊ کاکل، کریستا

**cristate** = crested

**cristallization** *noun*
بوونەکریـستاڵ، بلـووران، تـەورکان؟، بەتەورکبوون؟ ◊ تبلور

**cristallized** *adjective*
بلـووری، بلـووراوی، کریـستاڵی، کریـستاڵیزە، تەورکاو ؟ ◊ متبلور

**cristobalite** /krɪˈstəʊbəlaɪt/ *noun*
جۆرێ سیلیکا کە پێکهێنەری سەرەکی ئۆپاڵە (لە ناوی *Cerro San Cristóbal* مەکسیک، شوێنێ کە لەی دۆزراوە) ◊ کریستوبالیت

**criterion** /kraɪˈtɪəriən, US -ˈtɪr-/ *noun, pl.* criteria /-rɪə/
پێودانگ، پێوانە، پێوەر، تایـەرە، تێـساو، ئەندازە، هەڵـسەنگێنە: *The main criterion is value for money* ◊ *The most important criterion for entry is that applicants must design and make their own work* ◊ ملاک، سنجه، معیار، محک

**criterion analysis** *noun*
شـیکردنـەوەی پێودانـگ، پێودانـگ‌شـیکاری ◊ تحلیل معیار

**criterion of truth** *noun*
پێودانگی راستی ◊ معیار حقیقت

**critic** /ˈkrɪtɪk/ *noun*
1 رەخنـەگر، هەڵـسەنگێنەر، رەخنەسـاز: *a music/theatre/literary, etc. critic* 2 بـەئیراد، عەیب‌گر، والاگر (بنەڕەت: لە *criticus* لاتین، لە *kritikos* یۆنانی‌یەوە، لە *kritēs* "دادگـەرێک، a judge") ◊ 1 منتقد 2 خرده‌گیر

**critical** /ˈkrɪtɪkl/ *adjective*
1 رەخنـەیی‌یانـە، رەخنەگرانـە: *a critical comment/report* ◊ *The supervisor is always very critical* 2 گرنـگ، دیـاریکـەر، بڕیاردەر: *a critical factor in the election campaign* 3 مەترسی‌دار، قەیراناوی، تەنگژەیی، سـەخت، شپرزە، شلوق: *a critical moment in our country's history* ◊ *One of the victims of the fire remains in a critical condition* 4 بەئیراد، وردەگر، عەیب‌دۆزەرەوە، رەخنەگرانە، سـەربە رەخنـەگر 5 لێوەشـاو بـۆ رەخنـە ◊ 1 انتقـادی 2 مهـم، حیـاتی 3 بحرانـی، خطرنـاک 4 خرده‌گیر، منتقدانه 5 دارای صلاحیت انتقاد

**critical angle** *noun*
(رووناکی‌ناسی) گۆشـەی قـەیراناوی ◊ زاویـەی بحرانی

**critically** /-ɪkli/ *adverb*
1 رەخنەگرانە، لە رووی رەخنـەوە: *She spoke critically of her father* 2 بەشێوەیەکی قەیراناوی یان شپرزە ◊ 1 نقادانه 2 به طور وخیم

**critical mass** *noun*
(فیزیک) بارستەی قەیراناوی ◊ جرم بحرانی

**critical path analysis** *noun*
(ئابووری) دیاریکردنی باش‌ترین یان خێراترین

ریگا ○ تعیین بهترین یا سریع‌ترین مسیر

**critical point** *noun*
خالی قەیراناوی ○ نقطه‌ی بحرانی

**critical pressure** *noun*
(کیمیا) پاڵەپەستۆ یان گوشاری قەیراناوی ○ فشار بحرانی

**critical state** *noun*
(کیمیا) دۆخ یا باری قەیراناوی ○ حالت بحرانی

**critical temperature** *noun*
تیمپراچیری قەیراناوی ○ دمای بحرانی

**criticism** /ˈkrɪtɪsɪzəm/ *noun*
1 ڕەخنــــە، هەڵـــــەنگاندن، ڕەخنـــــەگری، ڕەخنەسازی 2 تێبینی یان وتاری ڕەخنەگرانە ○ 1 نقد، انتقاد 2 ملاحظه یا مقاله‌ی انتقادی

**criticizable** *adjective*
ڕەخنەهەڵگر، لەڕەخنەهاتوو ○ انتقادپذیر

**criticizer** *noun*
ڕەخنەگر ○ منتقد

**critique** /krɪˈtiːk/ *noun*
1 ڕەخنە، شەنوکەو: *a feminist critique of Freud's theories* 2 شی‌کردنەوەی ڕەخنەگرانە 3 ڕەخنەوتار، وتاری ڕەخنەیی ○ 1 نقد 2 تحلیل انتقادی 3 مقاله‌ی انتقادی

**critter** /ˈkrɪtə(r)/ *noun*
بوونەوەر، زیندەوەر (گۆڕاوی creator): *wild critters* ○ موجود

**croak** /krəʊk, US kroʊk/ *noun*
1 دەنگی خوێندنی بۆق، قیرەقیر، قرەقر، واقەواق 2 قارەقار، قیرەقیر، قاڕوقیڕ (قاڵاو) 3 خنەخن، سیخەسیخ، ڕخـەڕخ (مرۆ) ○ 1 غورغور (قورباغه) 2 قارقار (کلاغ) 3 خس‌خس

**Croatian** /krəʊˈeɪʃ(ə)n/ *noun, adjective*, also Croat
*n* 1 خەڵک یا ڕەسەنی Croatia 2 زمانی سلاڤی باشووری کرواتەکان، بە ئاوێتی ڕۆمی دەنووسرێ *adj* سەربە کرواتیا، خەڵکەکەی یان زمانەکەیان، کرواتیایی ○ کرواتیایی

**crochet** /ˈkrəʊʃeɪ, US kroʊˈʃeɪ/ *noun*
قولاپ‌چنی، چنین بە قولاپ یان شیشی سەرلار، قولاپ‌دۆزی، پارچەی دروس‌کراو بەو شێوە، قولاپ‌چن ○ قلاب‌بافی، کروچت

**croci** = plural form of crocus

**crocidolite** /krə(ʊ)ˈsɪdəlaɪt/ *noun*
کانەڕووتە، بەردەڕووتە: کانێکی ڕیشاڵاوی سەوز یان شین، کە سیلیاتی ئاسن و سۆدیۆم پێکدێنێ (بڕوانە tigereye؛ بنەڕەت: لە *krokis* یۆنـــــــانی "ڕووت" + *krokid*-lite) ○ کروسیدولیت

**crock**[1] /krɒk, US krɑːk/ *noun*
جەڕە، مەرکانە، گۆزە، سواڵەت ○ سبو، سفالینە

**crock**[2] /krɒk, US krɑːk/ *noun*
1 ماشێنی داشقەشکاو، ماشێنی چەپەرەشر، کەلاکەماشێن، شرەماشێن 2 کەلاکە ئەسپ، ئەسپی پیر 3 مرۆی دەستەوسان، هیچ‌لەدەس‌نەهاتوو ○ 1 اتومبیل ابوقراضه 2 اسب پیر 3 آدم بی‌عرضه

**crocked** /krɒkt, US krɑːkt/ *adjective*
1 شکاو، بریندار 2 مەست، کەیل ○ 1 شکسته، مجروح 2 مست

**crockery** /ˈkrɒkəri, US ˈkrɑːk-/ *noun*
گۆزەودیزە، قاپ‌وقاچاخی گڵێنە، گڵێنەمەنی، حاجەتی لە سواڵەت: *We had no fridge, cooker, cutlery or crockery* ○ ظروف سفالی

**crocket** /ˈkrɒkɪt/ *noun*
(بیناسازی گۆتیک) نەخشی قولایی ○ کروکت

**crocks** *noun, pl.*
گۆزەودیزە، قاپ‌وقاچاخی گڵێنە، گڵێنەمەنی ○ ظروف سفالی

**crocodile** /ˈkrɒkədaɪl, US ˈkrɑːk-/ *noun*
1 سووسمار، نەهەنگ (ی ڕووبار یان چۆم)، تیمساح، کرۆکۆدیل، کراکۆدیل [*Crocodylus* و توخمەکانی تر] 2 پێستە یان کەوڵی سووسمار 3 (بریتانیا و نافەرمی) ڕیزی شاگردان یان قوتابیان (بە جووت) ○ 1 تمساح 2 پوست تمساح 3 صف دانش‌آموزان مدرسه‌ای

**crocodile tears** *noun, pl.*
فرمێسکی تیمساح، گریانی زۆری یان (بە)ڕیایی، خەم‌خۆری درۆ ○ اشک تمساح

**crocodilian** /ˌkrɒkəˈdɪlɪən/ *noun*
(گیانەوەرناسی) سووسماری‌یەکان (بریتین لە crocodile، alligator، caiman و gharial) ○ کروکودیلی

**crocus** /ˈkrəʊkəs, US ˈkroʊ-/ *noun, pl.* crocuses or croci /-kaɪ, -kiː/
(ڕووەکناسی) زەردی باخی، گوڵەزافەران، ڕووەکێکی بەهاران پشکوتوو، لە خێزانی iris [توخم *Crocus*] ○ گل زعفران

**Croesus** /ˈkriːsəs/ *noun*
1 کریسێس، کراسوس (پاتشای دەوڵەمەندی ئاسیای بچووک (لیدیا Lydia) لە (546–560 پێش‌زایین‌دا) 2 زۆردەوەڵەمەند، قاڕوون، شەداد ○ 1 کریسس، کراسوس 2 بسیار ثروتمند

**croft** /krɒft, US krɔːft/ *noun*
1 کێڵگەی نووساو بە ماڵەوە 2 مووچەی چکۆلە، لاکێڵگە (ب.ت. لە سکاتلەند) ○ 1 کروفت 2 مزرعه‌ی کوچک

**crofter** /ˈkrɒftə(r), US ˈkrɔːft-/ *noun*
لاکێڵگەوان، وردەجووتیار، نیمچەجووتیار (ب.ت. لە سکاتلەند) ○ خرده‌زارع

**crohn's disease** /ˈkrəʊnz/ *noun*
نەخۆشی کرۆن (جۆری ئاوسانی درێژخایەنی ڕیخۆڵەکان، ب.ت. colon و ileum، لەگەڵ

بــرین و ناســـۆر fistula؛ بنـــەڕەت: لـــە نـــاوی پاتۆلۆژیستی ئەمریکایی *Crohn* .Burrill B)) ۞ بیماری کرون

**croissant** /'krwæsɒ̃, US krwɑː 'sɑ̃ː, krə'sɑːnt/ *noun*

کرواســان: جـۆرێ نـانی چـەماوەی فەرەنـسی، بەیانیان دەخورێ ۞ کرواسان

**Croix de Guerre** *noun*

نیـشانێکی سـەربازی (میلیـتاری) فـەرەنـسی کـە دەدرێ بـە کـردەوەیـێکی قـارەمانانـە لـە شـەڕدا (واتای خۆی: خاچی شەڕ) ۞ کروا دو گر

**Cro-Magnon** /krəʊ'manjɒ̃, US -'magnən/ *adjective, noun*

1 کرۆمانیۆن: مرۆڤی بەر لە مێژوو (35000 ساڵ لەوەپێش)، کە لە مرۆڤی ئێستا *Homo sapiens* دەچـێ، شـوێنەواریان لـە ئەشـکەوتی کرۆمـانی نزیک بە Les Eyzies فەرەنـسـەدا دۆزراوەتـەوە 2 مرۆڤی کرۆمانی ۞ 1 کرومانیون 2انسان کرومانی

**crombec** /'krɒmbɛk/ *noun*

دەنووکقـولاپی: جـۆرێ warblerی چکۆلـەی ئـــەفریکایی، کلکـــی زۆر کورتــــە [تـــوخم *Sylvietta*: چـــەنـدین جـــۆرن] (بنـــەڕەت: لـــە فـــەرەنـــسە، لـــە *krom* هولـــەنـدي "خـــوار، لار crooked" + *bek* "دەنووک beak") ۞ کرومبک

**cromlech** /'krɒmlek, US 'krɑːm-/ *noun*

1 تاشەبەردی تاقی، کراملێک، دۆلمێن dolmen 2 بازنەی بەردە وێستاوەکان (بنەڕەت: بە رێگای فەرەنسە لە *krommlec'h* بریتۆنەوە) ۞ دولمن

**crone** /krəʊn, US kroʊn/ *noun*

1 پـیرێـژنی ناحـەز، نـەنکـەقووتـەڵـە، پیرێـژنی زورهان، داپیر، دەڵەدێو، داڵکەپیران 2 پیرەمەڕ ۞ 1 عجوزە 2 گوسفند پیر

**cronies** *noun, pl.*

داروودەستە ۞ همپالکی‌ها

**Cronus** *noun*, Latin, from Greek *Kronos*

کرۆنۆس: تیتان یان تایتانێ Titan کە لە لایـەن کوڕەکەیەوە Zeus لەسـەر تەختی دەسەڵات لابرا ۞ کرونوس

**crony** /'krəʊni, US 'kroʊni/ *noun, pl.* cronies

رفێق یان دۆستی گیـانی‌گیـانی، ڕەفێق ۞ رفیـق صمیمی، همپالکی

**cronyism** /krəʊniɪzəm, US kroʊnɪzəm / *noun*, also croneyism

(سـووکانە) دامەزرانـدنی داروودەسـتە (ی خـۆ) لەسەر کار، خزمینەگەری (بەبێ لێوەشانەوەیان) ۞ کرونیسم

**crook** /krʊk/ *noun*

1 گۆچان، داردەست 2 پێچ، لاری، دانوشـتاوی، قـەد، خـواری، کـەچایی، کـەچی، خـواروخێچی، چـەماوی 3 قـولاپ 4 دز، چەتـە 5 نـەخۆش 6 تاوان‌کار، گوناەکار 7 دەسبر (لە *krókr* نۆرویژی کۆن "hook") ۞ 1 عصا 2 انحنا، خم 3 چنگک 4 دزد 5 مریض 6 مجرم 7 شیاد

**crookback** /'krʊkbæk/ *noun*

مرۆی پشت‌کوور یان پشت‌کۆم ۞ آدم کوژپشت

**crookbacked** /'krʊkbækd/ *adjective*

پشت‌کوور، پشت‌کۆم ۞ کوژپشت

**crooked** /'krʊkɪd/ *adjective*

1 لارووێر، چەپەک، ناڕاست، کووڕ، لار، خـوار، گـەڕاو، کـەچ، گێـر، چـەوت، خـواروخێچ، کـەڵوکـۆم، چـەماو، شـەفتوول 2 ناڕاسـت، ناسەرراسـت (crookedly /'krʊkɪdli/ *adv*) ۞ 1 کج‌وکوله، خمیده 2 غیرصادق

**crookedness** /'krʊkɪdnəs/ *noun*

لارووێری، چەپەکی، کـووڕی، لاری، خـواری، گەڕاوی، کەچی، گێری، چەوتی، خـواروخێچی، چەماوی ۞ کج‌وکولگی، خمیدگی

**Crookes tube** *noun*

لوولەی کرووک یان کرووکس: جۆرێ لوولـەی تیشکی کاتۆد cathode-ray (بنەڕەت: لە نـاوی فیزیک‌زان و کیمیازانی ئینگلیسی Sir William *Crooks* (1832–1919) ۞ لولەی کروک

**crookneck** *noun*

جـۆرێ کوولـەکـە squash بـە ملێکـی درێـژی پشتەوەچەماو ۞ نوعی کدو

**croon** /'kruːn/ *noun*

1 نالە 2 وێرە، ورینگە ۞ 1 نالە 2 زمزمە

**crooner** /'kruːnə(r)/ *noun*

گۆرانی‌بێژی گۆرانی‌یە بەسـۆز و سێنتیمێنتاڵـەکان (1930–1940) ۞ کرونر

**crop** /krɒp, US krɑːp/ *noun*

1 بەرهـەم، بـەروبۆ، بـەروبـوو، بـەربێل، بـەرجفت، ڕێـژان، ئـاژار، داهـات، هـاورد، حاسڵ 2 دەسـتە، گروپ، کۆمەڵ، تاقم 3 زنجیرە، لێزگـە، خێـزەرە، ڕیچکـە 4 چیکـڵدانە، گورچـوو، جیکەڵـدانە، کاسـێنوک، هێـرک، چکلانـە 5 شـێلاق، تـاژان، جەڵـدە 6 دەسـگ یـان قوڵفەی شـێلاق 7 قـژی کورت، سەری تاشراو ۞ 1 فرآوردە، محـصول 2 گروە، جمعیت 3 رشتە، سری 4 چینەدان 5 تازیانـە 6 دستەی تازیانە 7 موی کوتاە

**crop-duster** *noun*

دەرمان‌لێدەر (بە فڕۆکە) ۞ سمپاش

**crop-dusting** *noun*

دەرمان‌لێدان (بە فڕۆکە) ۞ سمپاشی

**crop-erared** *adjective*

گوێ‌بڕاو، گوێ‌قرتاو، قوڵ ۞ گوش‌بریدە

**cropped** *adjective*

لە بنەوە تاشراو، سوورکردوو، زۆر کـورت (قژ) ۞ از تە زدە

**cropper**[1] /'krɒpə(r), US 'krɑːp-/ *noun*

1 گیـا، ڕووەک 2 دەزگـا یـا ماشـێنی سـەرتاشـین

۞ 1 گیاه 2 ماشین موزنی
**cropper**² /'krɒpə(r), US 'krɑ:p-/ *noun*,
come a cropper
1 تێشکان، فشەڵ، سەرنەکەوتن (توند و ناکاو) 2 هەڵکەوتن، سەرەنگرێ دان ۞ 1 شکست 2 سکندری خوردن
**croppy** /'krɒpɪ/ *adjective*
سەرتاشیو، سەرکورتەوەکردوو ۞ کروپی
**crop rotation** *noun*
نوێبەکێل، وەرزوەرز، وەرزەکێل، سووڕەکێل، وەرزەشێو ۞ کشت تناوبی
**crops** *noun, pl.*
چاندن، چەقاندن ۞ کشت
**crop-sprayer** = crop-duster
**crop-spraying** = crop-dusting
**crop top** *noun*, also cropped top
ژێرکراسی ژنانە ۞ رکابی زنانە
**croquet** /'krəʊkeɪ, US krəʊ'keɪ/ *noun*
گۆیێن (لەسەر مێرگ و چیمەن دەکرێ) ۞ کروکە
**croquette** /krəʊ'ket, US krəʊ-/ *noun*
کروکێت (جۆرێ کفتە) ۞ کروکت
**crore** /krɔ:(r)/ *noun*, cardinal number
کرۆر، کرور، دە میلیۆن، سەدیەکی lakh (لە هیند و پاکستان) ۞ کرور
**crosier** /'krəʊzɪə(r), US 'krəʊʒər/ *noun*
گۆچانی سەرقەشە یا گەورەقەشە ۞ عصای اسقفی
**cross-** *combining form*
(لە لێکدانا وەک پێشگر): 1 ئاماژە بە جووڵان و بزووتنێ دەکا کە لەمبەر بۆ ئەوبەر بێ: *cross-channel* 2 ئاماژە بە کارلێککردن یان کارلێک دەکا: *cross-pollinate* 3 ڕۆیشتن یان تێپەڕین لە لایێکەوە بۆ لایێکی تر، لەم لاوە بۆ ئەولا: *crosspiece* 4 باسی جۆرێ یان شێوەی خاچ دەکا: *crossbones* ۞ (در ترکیب) 1 اشارە بە حرکت در عرض چیزی 2 اشارە بە برهم‌کنش 3 عبور یا گذشتن از یک سو بە سوی دیگر 4 اشارە بە نوع چلیپا
**cross**¹ /krɒs, US krɔ:s/ *adjective* (crosser, crossest)
1 تووڕە، ڕقهەستاو: *I was cross with him* ◊ *Please don't get cross. Let me explain for being late* 2 پێچەوانە (با) 3 ئاسۆیی، پۆیی 4 یەکتربڕ، چەپوڕاست، هاوبڕ ۞ 1 عصبانی 2 مخالف (باد) 3 افقی 4 متقاطع
**cross**² /krɒs, US krɔ:s/ *noun*
1 خاچ، چەلیپا 2 مەینەتی، ڕەنج، کوێرەوەری، دەرد، بەڵا، کوڵوڵی 3 نیشانەی خاچ 4 دروشمی خاچ (نیشانەی ئازایەتی) 5 نیشانەی چەپوڕاست، یەکتربڕ یان لەگەڵ (×، +) 6 گیانەوەری دوڕە یان دوورەگە 7 گیا یان ڕووەکی متوربەکراو، ڕووەکی پەیوەستکراو 8 تێکەڵە: *A mule is a cross between a horse and a donkey* ◊ *The play was a cross between a farce and a tragedy* 9 (میکانیک) چوارڕێ، چوارڕێیانە 10 هێڵی ئاسۆیی (وەک لە پیتی f و t) بنەڕەت: ئینگلیسی کۆن، لە kross نۆرسی کۆن، لە cros ئیرلەندی کۆن، لە crux لاتین) ۞ 1 صلیب، چلیپا 2 مصیبت، درد 3 علامت صلیب 4 مدال شجاعت 5 علامت ضرب‌در یا بعلاوە 6 حیوان دورگە 7 گیاه پیوندی 8 آمیزە 9 چهارراە 10 خط افقی
**Cross** /krɒs, US krɔ:s/ *noun*
1 هێمای دیانەت یان کریستانیەت 2 دینی کریستانیەت ۞ 1 نماد مسیحیت 2 دین مسیح
**crossbar** /'krɒsbɑ:(r), US 'krɔ:s-/ *noun*
1 دەستەک یان میلەی سەرەوەی دەروازە، تیر یان دەستەک یان میلەی ئاسۆیی دەروازە (تۆپێن) 2 میلەی سەرەوەی چەرخ ۞ 1 تیرک افقی دروازە 2 میلەی عرضی تنە
**crossbarred** /'krɒsbɑ:d, US 'krɔ:s-/ *adjective*
1 خاوەن دەستەک یان میلەی سەرەوەی دەروازە 2 خاوەن میلەی سەرەوەی چەرخ ۞ دارای میلەی عرضی
**crossbeam** *noun*
کاریتە، بالار، رایەڵ، شاتیر، پەراسووە، دارەڕا ۞ شاەتیر، تیر عرضی
**crossbencher** *noun*
نوێنەری سەربەخۆ (کە لەلایەن پارتییەکی ڕامیارییەوە پشتیوانی ناکرێ، پارلیمانی بریتانیا) ۞ نمایندەی منفرد
**crossbenches** *noun, pl.*
کورسی نوێنەرانی سەربەخۆ (لە بەشی پشتەوەی پارلیمان، بریتانیا): *members who sit on the cross benches* ۞ جایگاە نمایندگان منفرد
**crossbill** *noun*
(گیانەوەرناسی) جۆرێ سەیرە، سەیرەی (دە)نووکخاچی [*Loxia curvirostra* و جۆرە پێوەندیدارەکان] ۞ نوعی سهرە
**crossbones** /'krɒsbəʊnz, US 'krɔ:sbəʊnz/ *noun*
نیشانەی مەرگ، نیشانەی ئێسکی چەپوڕاست، مەرگەنیشان (لەگەڵ skull and crossbones بەراوردی کە) ۞ علامت خطر مرگ
**crossborder** *noun*
نێو(ان)سنووری (چالاکی): *cross-border trade* ۞ میان‌مرزی
**crossbow** /'krɒsbəʊ, US 'krɔ:sbəʊ/ *noun*
کەوانخاچی، پۆلاکەوان، کەوانی خاچی یان تفەنگی ۞ کمان زنبوری
**crossbowman** *noun, pl.* crossbowmen
تیرهاوێژ بە کەوانی خاچی ۞ کماندار زنبوری

**crossbred** *adjective*
دووڕەگە، دووڕە ◌ دورگە
**crossbreed** /'krɒsbri:d, US 'krɔ:s-/ *noun*
1 گیانەوەری دووڕەگە 2 گیا یان رووەکی متوربەکراو، رووەکی پەیوەستکراو ◌ 1 حیوان دورگە 2 گیاه پیوندی
**crossbreeding** /'krɒsbri:dɪŋ/ *noun*
متوربە یان پێوەستی دووڕەگەیی، دووڕەگەگیری ◌ پیوند دورگەای
**cross-Channel** *adjective*
لە ڕێگای دەریای مانشەوە ◌ از طریق دریای مانش
**cross-check** *noun*
1 لێکۆڵینەوە، پەیجوری، پشکنین، هەڵسەنگاندن، بەریەکدان، پێکگرتن 2 لێکدانەوە، پیاچوونەوە، چاولێکردنەوە ◌ 1 بررسی، مقایسە 2 محاسبە، بازبینی
**cross-country** *noun*
وەرزش یان پێشبڕکێی ڕاکردنی دەشتی یان لە دەشت: *Who won the cross-country?* ◌ ورزش یا مسابقەی دو صحرایی
**cross-country** *adjective, adverb*
1 تێپەڕین لە دەشتودەر (لەچاو ڕێگاوبان): *cross-country train journeys* 2 دەشتی، لە دەشت (پێشبڕکێ): *cross-country running* ◌ 1 *We rode cross-country* از راه فرعی 2 صحرایی
**cross-country race** *noun*
پێشبڕکێی ڕاکردنی دەشتی ◌ مسابقەی دو صحرایی
**cross-country skiing** *noun*
سکی دەشتی ◌ اسکی صحرایی
**cross-cultural** *adjective*
نێوانچاندی، نێوفەرهەنگی، نێوانکولتوری: *Minority cultures within the United States often raised issues of cross-cultural conflict* ◌ میانفرهنگی
**crosscurrent** *noun*
ڕۆیینی دژ، دژڕەوت، پەرچەتەوژم، ڕەوتی دژ و پێچەوانە، پەرچەڕەوت: *Crosscurrents can sweep the strongest swimmer helplessly away* ◊ *the crosscurrents within the Conservative Party* ◌ جریان مخالف
**crosscut** /'krɒskʌt/ *noun*
(ڕێگا) نێوبڕ، لابڕ، قەدبڕ، سەربڕ ◌ میانبر
**crosscut saw** *noun*
مشاری دژبڕ، هەڕە یان مشاری دووسەر ◌ ارەی دوسر
**cross-dating** *noun*
ڕێکەوتدانانی (چەپوڕاستی: شتەکان بەهۆی هاوپێوەندییان لەگەڵ مێژووناسی شوێن یان چاندێکی تر) ◌ کراسدیتینگ
**cross-division** *noun*
پۆلاندنی چەپوڕاستی ◌ طبقەبندی متقاطع
**cross-dresser** *noun*
دژپۆش ◌ کراسدرسر
**cross-dressing** *noun*
دژپۆشی (لەبەرکردنی بەرگی ڕەگەزی بەرامبەر) ◌ کراس درسینگ
**crosse** /krɒs/ *noun*
گۆچان یان داری یاری lacrosse ◌ کراس
**cross-examination** *noun*
لێپرسینەوە، ڕووبەڕووکردنەوە ◌ بازجویی، استنطاق
**cross-examiner** *noun*
لێپرس، لێپرسەرەوە ◌ بازجو، مستنطق
**cross-eye** /'krɒs aɪ/ *noun*
خێلی، چاولاری ◌ لوچی
**cross-eyed** /'krɒs aɪd/ *adjective*
خێل، چاولار: *I'm going cross-eyed, working on those handwritten texts all day* ◌ لوچ، احول
**cross-fertilization** *noun*
1 (ڕووەکناسی) چاککردنی لە جۆرێکی تر، چاککردنی گیایێ بە هەڵاڵەی گیایەکی تر (هەر لەو جۆرە) 2 لێکمتوربەکردن، خاچەپیتاندن، چاککردن یان پیتاندنی چەپوڕاستی، پیتاندنی دووڕەگەیی 3 کارلێک، پەرچەکردار ◌ 1 دگرگشنگیری 2 کراس فرتیلیزاسیون 3 واکنش متقابل
**crossfire** /'krɒsfaɪə(r), US 'krɔ:s-/ *noun*
1 ئاگربارانی چەپوڕاستی، یەکتربڕ، یان چەندلایەنە، ئاگری یەکتربڕ 2 گێچەڵ ◌ 1 آتش متقاطع 2 مخمصە
**cross-grained** /ˌkrɒs 'greɪnd, US ˌkrɔ:s-/ *adjective*
1 ڕەگناڕێک، ڕەگچەپوڕاستی، خاوەنی کۆمەڵێ ڕەگی ناڕێکوپێک، ڕیشاڵناڕێک 2 خوێنتاڵ، ناجسن، لاسار ◌ 1 دارای رگەهای نامنظم 2 بدقلق، خودرأی
**cross-hatching** *noun*
هاشوور(ی چەپوڕاستی یان حەسیری)، سێبەرە(کردن) ◌ هاشور
**cross-head** *noun*, also cross-heading
(وتار یان بابەتی ڕۆژنامەیێ) لاسەردێڕ ◌ عنوان فرعی
**cross index** *noun*
ژێدەری چەپوڕاستی، سەرچاوە ◌ ارجاع متقابل، ارجاع
**crossing** /'krɒsɪŋ, US 'krɔ:s-/ *noun*
1 گەڕان یان سەفەر (بە کەشتی): *a three-hour ferry crossing* ◊ *the first Atlantic crossing* 2 خاڵی یەکتربڕ، چوارڕێیانە، دوڕیانە، هاوبڕە، هاوبڕگە، 3 intersection

شوێنی پەڕینەوە (ب.ت. سەر شەقام): *The next crossing point is a long way downstream* 4 سەرسنوور 5 (بیناسازی) شوێنی یەکتربڕینی کلێسە 6 تێپەڕین: *attempted crossings of the border* ◇ 1 مسافرت 2 نقطەی تقاطع، دوراهی 3 محل عبور، گذرگاه عابر پیادە 4 سر مرز 5 کراسینگ 6 عبور، گذشتن

**crossing over** *noun*, also crossing-over
(بۆماوەناسی) هاوبڕی و ئاڵوگۆڕ، کراسینگ‌ئاڤێر: ئاڵوگۆڕی ژێنەکان (یان کەرتەکان sement) لە نێوان کرۆمۆزۆمە جوتیەکان (بەهۆی شکان و یەک‌گرتنەوەیان)، ئاڵوگۆڕی کەرتە کرۆماتیدەکان نێوان جووتێ کرۆمۆزۆم بە درێژایی میوزدا meiosis ◇ کراسینگ اور

**crossing point** *noun*
بنکەی سەرسنوور ◇ پاسگاه مرزی

**crossing tower** *noun*
کەلوو یان برجی چەپوڕاستی (یان یەکتربڕ) ◇ برج متقاطع

**crossing vault** *noun*
تاقی چەپوڕاستی یان یەکتربڕ ◇ تاق متقاطع

**cross-legged** /ˌkrɒs ˈlegd, -ˈlegɪd, US ˌkrɔːs/ *adjective*
چوارمشقی، پێ‌لەسەرپێ: *the cross-legged figure of the Hindu god* ◊ *He sat cross-legged on the floor* ◇ چهارزانو

**crosslet** *noun*
خاچی چکۆلە، ب.ت. وەک نیشانەی خاوخێزانی ◇ صلیب کوچک

**cross link** *noun*
پێوەندی چەپوڕاستی ◇ رابطەی متقاطع

**crossly** /krɒsli, US krɔːsli/ *adverb*
خوێنتاڵانە: *'Well what did you expect?' she said -sly* ◇ با بدعنقی

**crossness** *noun*
خوێن‌تاڵی، رووگرژی ◇ بدعنقی

**cross of Lorraine** *noun*
جۆرێ خاچی دوو میل کە میلی خوارەوەیان لە هی سەرێ درێژترە (هی Lorraine ی فەرەنسە) ◇ نوعی صلیب

**crossopterygian** /ˌkrɒsɒptəˈrɪdʒɪən/ *noun*
(گیانەوەرناسی) باڵەگوڵنگە، پەرەگوڵنگە، پلەباڵ، جۆرێ ماسی لە ژێربۆلی Crossopterygia، بە بوونی باڵ پل‌پل و گۆشتی‌یەوە جیادەکرێتەوە (بنەرەت: لە *Crossopterygia* لاتینی نوێ، لە *krossos* یونانی "tassel" + *pterux, pterug-* "fin") ◇ کروسوپتریجین

**crossover** /ˈkrɒsəʊvə(r), US ˈkrɔːsoʊ-/ *noun*
1 هێڵی گۆڕین (هێڵی ئاسن) 2 تێپەڕین 3 تێپەرگە، دەربازگە، شوێنی پەڕینەوە 4 گۆڕان ◇ 1 کراس‌اور 2 عبور 3 معبر 4 تغییر

**crosspatch** /ˈkrɒspætʃ/ *noun*
مرۆ یان بنیادەمی خوێنتاڵ ◇ آدم بدعنق

**crosspiece** /ˈkrɒspiːs, US ˈkrɔːs-/ *noun*
ئەسپەرە، پارچەی پۆیی یا ئاسۆیی (تکنیکی)، میلی ئاسۆیی، میلی پۆیی ◇ قطعەی عرضی یا افقی

**cross-ply** *adjective*
(تایەی ماشین) دەزوویی، دەزووکێش، دەزووچن، بە دەزووی یەکتربڕەوە یان چەپ و ڕاستەوە ◇ کراس‌پلی

**cross-pollination** *noun*
چاک‌کردن یان پیتاندنی گیا یان گوڵێ لە هەڵاڵەی جۆرێکی تر ◇ لقاح

**cross-purpose** *noun*
خراپ لێک‌گەیشتن ◇ سوءتفاهم

**cross-reference** *noun*
گەڕانەوە یان گەڕاندنەوە، گەڕانەوەی نێودەقی (بۆ بەشێکی تری کتێب، فایل و هتد بەمەبەستی زانیاری زۆرتر) ◇ ارجاع، ارجاع درون‌متنی

**crossroad** /ˈkrɒsrəʊd, US ˈkrɔːs-/ *noun*
لارێ، رێگای لاوەکی یان ناسەرەکی ◇ جادەی فرعی

**crossroads** /ˈkrɒsrəʊdz, US ˈkrɔːsroʊdz/ *noun*
1 چوارڕێ(یانە)، چوارڕیانە، چوارڕێیانە، هاوبڕگە: *At the next crossroads, turn right* 2 خاڵی ورەچەرخان 3 خاڵی بڕیاردان، دوڕیانەی گرنگ ◇ 1 تقاطع 2 نقطەی عطف 3 نقطەی تصمیم‌گیری

**cross section** *noun*, also cross-section
1 پانەبڕگە: *a diagram representing a cross section of the human eye* ◊ *the human eye in cross section* 2 بڕگە، نموونە، برشت: *a representative cross section of society* ◊ *a wide cross section of the population* ◇ 1 برش عرضی 2 مقطع، برش، نمونە

**cross-sectional** *adjective*
پانەبڕگەیی ◇ وابستە بە برش عرضی

**cross-stitch** *noun*
1 تەقەڵی چەپوڕاستی یان یەکتربڕ 2 دروومان بە تەقەڵی چەپوڕاستی یان یەکتربڕ ◇ 1 کوک ضربدری 2 کراس‌ستیچ

**cross street** *noun*
شەقامی چەپوڕاستی یان یەکتربڕ، چوارڕێ(یانە) ◇ خیابان متقاطع

**cross-subsidization** *noun*
یارمەتی‌دانی چەپوڕاستی، باربووپێ‌کردنی یەکتربڕ ◇ یارانەدهی متقاطع

**cross-subsidy** *noun*
یارمەتی چەپوڕاستی، باربووی یەکتربڕ ◇

یارانەی متقاطع

**cross-talk** /'krɒstɔ:k, US 'krɔ:s-/ *noun*
1 وتوویـــــز، دیـــــالوگ 2 (قــــسەکردن) کەوتنەسەریەک یا کەوتنەسەرخەت و هێڵی (وەک لە تەلەفون، رادیۆ یا کامپیوتیردا) ◌ 1 گفتگو 2 کراس‌تاک

**crosstie** *noun*, also cross tie
دەستەک، کراستای (ڕێگای ئاسن) ◌ کراستای

**cross-town** /ˌkrɒs'taʊn, US ˌkrɔ:s-/ *noun*
سەرانسەری، سەرتاسەری (شار): *a crosstown bus* ◌ سراسری

**cross-voting** *noun*
دەنگدانی چەپوڕاستی (بە لایەنێ کە سەربەو نییە یا چەند لایەنێکی تر) ◌ رأی‌دهندگی متقاطع

**crosswalk** /'krɒswɔ:k, US 'krɔ:s-/ = pedestrian crossing

**crosswind** /'krɒswɪnd, US 'krɔ:s-/ *noun*
بای پێچەوانە، پەرچەبا (هاوتەریبی ڕەوتەکە نییە، وەک هی فڕۆکە): *Strong crosswinds blew the plane off course* ◌ باد مخالف

**crosswise** /'krɒswaɪz, US 'krɔ:s-/ *adverb*, also crossways, *adjective*
1 *adv* یەکتربڕانە، بە چەپوڕاستدا، کەش‌وتووش، قیچەڵقاچ: *Cut the fabric crosswise* - 2 لە شێوەی خاچ، خاچی 1 *adj* گلاوەتە نێو کێشەیێکەوە: *got crosswise with his teacher* - 2 1 *adv* ◌ crossing ,transverse به طور متقاطع، ضرب‌دری 2 به شکل صلیب *adj* درگیربودن در اختلاف

**crossword (puzzle)** /'krɒswɜ:d, US 'krɔ:swɜ:rd/ *noun*
خشتەی وشە چەپوڕاست یان یەکتربڕەکان، (خشتەی) وشە تان‌وپۆکان ◌ جدول کلمات متقاطع

**crotal** = crottle

**crotale** /'krəʊt(ə)l/ *noun*
سنجۆکە، سنجی چکۆلانە ◌ کروتال

**crotch** /krɒtʃ, US krɑ:tʃ/ *noun*
1 خشتەک، نێوگەڵ، ناولنگ 2 جێی لێ‌بوونەوە، 3 دوحاچە، دوپەلان، دوفاقە، دووفلیقانە، دووڕیانە، دوولکە 4 (تویکاری) چەلەمەی (crotched *adj*) ◌ 1 فاق، خشتک 2 کراچ 3 دوشاخه 4 (معماری) جناغی

**crotchet** /'krɒtʃɪt, US 'krɑ:tʃ-/ *noun*
1 (موسیقا) کراچیت، نوار 2 بیرۆکەی سەیر و نائیرانە 3 قولاپ، قەلانگ (چکۆلە) ◌ 1 نت سیاه 2 اندیشه یا ایده‌ی معقول و عجیب و غریب 3 قلاب

**crotchetiness** *noun*
خوێتتالی، ڕووگرژی، ڕووتالی، مرومۆچی ◌ بدعنقی، عبوسی

**crotchety** /'krɒtʃəti, US 'krɑ:tʃ-/ *adjective*
خوێتتال، ڕووگرژ، ڕووتال، مرومۆچ: *a crotchety old man* ◌ بدعنق، عبوس

**croton** /'krəʊt(ə)n/ *noun*
(ڕووەکناسی) گەرچەکی هیندی؟ 1 جۆری دار، دەوەن یان گیاوگژێ، ڕەسەنی ناوچە گەرمێن و گەرمەکان [توخم *Croton*] 2 جۆرێ دار یان دەوەنی سەوزەونی چکۆلەی ناوچەی هیند و پاسیفیک، بە گەڵاوێژی ڕەنگینەوە [توخم *Codiaeum*] ◌ حب‌السلاطین

**Croton bug** = German cockroach

**crottle** /'krɒt(ə)l/ *noun*, also crotal
کرێژەبەردێکی ئاسایی، لە سکاتلەند بۆ گرتنی ڕەنگ و دروستکردنی tweed بەکاردێتری [*Parmelia saxatilis* و جۆرەکانی تر] ◌ کروتل

**crouch** /kraʊtʃ/ *noun*
هەڵتروشکان، هەڵتووتان، قینچکە(کردن)، کوشکە(کردن)، هەڵکورمان، خۆمات‌کردن، خۆمەڵاس‌دان، کسکە ◌ قوز

**croup**[1] /kru:p/ *noun*
دووشاخە، وەناق، کەلەشێرە، پێران، تاس (هەڵاوسانی قورگ larynx و قورقوراگە trachea و bronchi لە (شیرەخۆرە و) منداڵاندا، بەهۆی ڤایرۆسێکە تووش دەبێ کە لەودا هەناسە تووشی کێشە دەبێ و کۆخە گڕ دەبێ croupy (*adj* (croupier, croupiest)) ◌ خناق، خروسک

**croup**[2] /kru:p/ *noun*
تەرماڵ، سمت، کلۆت، پاشوو (ئەسپ و گیانەوەرە چوارپێکان) ◌ کفل

**croupade** /krʊ'peɪd/ *noun*
مەلاسە، بازدانی ئەسپ بە چوارپەلی خڕەوەبوو ◌ کروپید

**croupier** /'kru:pieɪ, US -piər/ *noun*
مێزەوان، بەرپرسی مێز، مێزپرس، مێزگێر (کازینۆ) ◌ کروپیه

**croupous** /'kru:pəs/ *adjective*
تووش‌بوو بە دووشاخە ◌ مبتلا به خناق

**croupy** *adjective*
دووشاخەدار، تووش‌بوو بە دووشاخە ◌ دچار خروسک

**crouton** /'kru:tɒn, US -tɑ:n/ *noun*
کرووتان، قرمزی (پرزەنانی برژاو بۆ کردنە نێو سوپ یان وەکوو بەشێ لە سالات) ◌ کروتن

**Crow** *noun*
1 ئەندامی گەلێکی سوورپێست، دانیشتووی Montana 2 زمانی Siouanی ئەو گەلە ◌ کرو

**crow** /krəʊ, US kroʊ/ *noun*
1 (گیانەوەرناسی) قەلەڕەشە، قالاو، قەلاسیلکە، قازوو، قەلەڕەشکە [*Corvus corone* (هی کەلاکخۆر) و جۆرە پێوەندیدارەکان، خێزان Corvidae] 2 خوێندنی کەلەشێر، قووقە 3

پیرێژنی ناحەز و پیر، پیرێژنە قوێتر ۞ 1 کلاغ 2 بانگی خروس 3 پیرزن زشت و پیر

**crowbar** /ˈkrəʊbɑː(r), US ˈkroʊ-/ *noun*

لۆسە، شیروکۆڵ، باری، مەلغە، نوێل، نێل، سمک ۞ دیلم

**crowberry** *noun, pl.* crowberries

1 جۆرێ دەوەنی گیاگەسکەئاسای هەڵچووی چکۆلـە، بـە بـەری رەش و گـەڵای وردەوە [*Empetrum nigrum*] 2 بەرەرەشی خۆراکی بەلام بێبۆنی ئەو دەوەن یان رووەکە ۞ کروبری

**crowd** /kraʊd/ *noun*

1 کۆمەڵ، کۆمەڵە، دەستە، کۆڕ، جەماعەت، گەلە، گیفالە 2 گەل، خەڵک، جەماوەر، خەڵکی رەمەکی 3 ئاپۆرە، چڕەبەندان، جمە، گوردەم، قەرەباڵغی، تـێڕژاوی، گانـەگۆل، جـەنجاڵ، شـلۆقایی 4 بینەران 5 ژمارەیەکی زور، گەلێک 6 کۆما، لۆدە، کۆلێ ۞ 1 جمعیت، جماعت 2 مردم، عوام‌الناس 3 ازدحام 4 تماشاچیان 5 عدەی زیاد 6 کپە

**crowded** /ˈkraʊdɪd/ *adjective*

چڕەبەنـدان، شـلووق، قەرەباڵـغ، پـڕئاپۆرە، جمەڵێهاتوو، پڕشانەچرکێ، کەڵەکەبرێ، بە شـانەترنجێ، چێوکـوت، جـەنجاڵ، تـێڕژاو: *a* ◊ *a crowded bar* ◊ *crowded streets* *room crowded with books* ۞ پرازدحام

**crowded out** *adjective*

پڕی پڕ، جێگای دەرزیخستن نەبوونەوە، تەنراو ۞ پُر پُر

**crowdie** /ˈkraʊdi/ *noun*, also crowdy

جـۆرێ پـەنیرێ نـەرمی سـکاتلەند (لـە شـیری هەڵگەراو) ۞ کرودی

**crow-puller** *noun*

(نافـەرمی، کـەسـێک یـان رووداوێـک) سەرنجڕاکێش، خەڵکڕاکێش، خەڵکپەسند ۞ (آدم یا حادثە) جذاب

**crow-pulling** *noun*

(مرۆ یان رووداو) سەرنجڕاکێشی ۞ جذابیت

**crowfoot** *noun*

(رووەکناسـی) گیـازەردەلـە، پـێقـالاو [*Ranunculus aquatilis* (هـی ئـاوی) و جۆرەکانی تر] ۞ زر قوری، پنجەکلاغ

**crowing** *noun*

خوێندنی کەڵەشێر، قووقە ۞ بانگ خروس

**crown** /kraʊn/ *noun*

1 تاج 2 پاتشایەتی، تاجوتەخت، تەختوتاج 3 تاجـەگوڵ 4 نیـشـان یـان دروشمـی تـاج 5 بەڕێوەبەرایەتی یان هێز و دەسـەلاتی شا یان شاژن 6 سەرناوی فارەمایی 7 خەلات 8 نووک، سەر، بەشی سەرەوە، سەرکەل، تەوق، نووچکە، تەپڵ 9 تاجی ددان، رووپۆشی ددان 10 ترۆپک، دوند، لووتکە 11 کوینی جارانی بریتانیا بەرامبەر بـە 5 شـیلینگ یـان 25 پێنـس 12 کـاغزێ لـە ئەندازەی 504 × 384 میلیمیتر 13 کتێبێ لە ئەندازەی 189 × 246 میلیمیتر ۞ 1 تـاج 2 سلطنت، تاجوتخت 3 حلقەی گل 4 نـشـان تـاج 5 کراون 6 عنوان قهرمانی 7 جایزە 8 نوک، قلە، فـرق 9 تاج دندان، روکش دندان 10 اوج 11 و 12 کراون

**crown and anchor** *noun*

تاج و لەنگەر (قومار) ۞ کراون اند آنچور

**crown colony** *noun*

دگیرگە یا کۆلۆنی بریتانیا ۞ مستعمرەی انگلیس

**Crown Court** *noun*

دادگای تاوانکاری (بریتانیا و ویلز) ۞ دادگاه کیفری

**crowned** *adjective*

1 تاجدار 2 رووکێشدار، رووپۆشدار (ددان) 3 لە لووتکەدا، بە ترۆپکگەیشتوو ۞ 1 تـاجدار 2 روکشدار 3 در اوج

**crowned head** *noun*

شا یان شاژن، تاجبەسەر ۞ پادشاه یا ملکە

**crown gall** *noun*

جۆرێ gallی گەورەی تۆمۆرئاسای سەر رەگ و ریشە یان بەشی خوارووی قەد دار، بەهۆی بەکتریایێکەوە تووش دەبێ ۞ کراون گال

**crown glass** *noun*

جـۆرێ شووشـەی بـێ ئاسـن و قورقوشـم، لـە بنەڕەتا بە شێوەی تـەبەقێکی خڕ، بۆ شـووشـەی چاویلکە بەکاردێترێ ۞ کراون گلاس

**crown imperial** *noun*

(رووەکناسی) شلێرە، قەقلەبازی؟، شاگوڵـبەند، گوڵبەندی پاشا: جۆرێ fritillaryی ئاسیایی، بە هێشووی گوڵی زەنگوڵەئاساوە بەسەر لاسکی درێژییەوە [*Fritillaria imperialis*] ۞ لالەی سرنگون

**crowning** /ˈkraʊnɪŋ/ *noun*

1 ئەوپەڕ، بەرزترین، چاکترین، باشترین 2 تەواوکردن ۞ 1 حد اعلا، بهترین 2 تکمیل

**crown jewels** *noun, pl.*

ئەو گەوهەر و زێڕ و زیوەی کە شا یان شاژن لە بۆنەیەکی فەرمیدا بەخۆیاندا هەڵدەواسن ۞ جواهرات سلطنتی

**crown land** *noun*

زەویوزاری پادشایی (یان پاتشایی) ۞ اراضی سلطنتی

**crown lens** *noun*

هاوێنـە یـان لێنزێ کـە لـە شووشـەی کـراون دروست دەکرێ ۞ لنز کراون

**crown of thorns** *noun*, also crown-of-thorns starfish

1 جـۆرێ ئەسـتێرەی دەریـایی درکـاوی، هـی گەرمێنانی هیند و پاسیفیک، شیلان یان مەرجان 2 [*Acanthaster planci*] دەخـوا coral گـوڵبـەنـدی درک: جـۆرێ دەوەنی درکـاوی

*Euphorbia milii*] (ماداگاســـکار، وەک گیاێکی خانەکی باو) و جۆرەکانی تر] ۞ کراون اف تورنس

**crownpiece** *noun*

سیرمە یان قایشی هەوسار کە لە هەردوو سەری ئەسپ توند دەکرێ یا دادەبەسترێ ۞ کراونپیس

**Crown Prince** *noun*

بریشا، جێگری شا، وەلیعەهد ۞ ولیعهد

**Crown Princess** *noun*

1 بریشاژن، ژنی جێگری شا یان بریشا 2 شاژنی داهاتوو ۞ 1 همسر ولیعهد 2 ملکەی آینده

**crown saw** = hole saw

**crown vetch** *noun*

جـــۆرێ رووەک، لـــە خێـــزانی legume [*Coronilla varia*] ۞ نوعی گیاه

**crow's feet** *noun, pl.*

1 چرچولۆچی یان گنجی دەور(وبەر)ی چاو 2 قولاپ 3 چوکلە، سێپەڕ (میلیتاری) ۞ 1 چین و چروک دور چشم 2 قلاب 3 خسک

**crow's nest** *noun*

پلاتفۆرم یان هەرزالە یان پەناێکی سەر دارالای کەشـتی (جێگـای نۆبـەدارانی کـەشـتیـیـە)، چاودێرگە ۞ اتاقک دیدەبانی

**crozier** = crosier

**cruces** = plural form of crux

**crucial** /'kru:ʃl/ *adjective*

1 هەرەگرنگ، گشپێبەند، هەستیار، بڕیاردەر، یـەکلایی کـەرەوە، دیـاری کـەر، بڕێنـەرەوە، چـارەنووسـساز، significant ،important *a crucial step* :decisive ،essential ،critical *topics* ◊ *a crucial factor/issue/decision* ◊ 2 *of crucial importance* سـەخت، دژوار، ناســێ، ناســتەنگ 3 (پزشـکی) خـاچی، چـەپوراستی، چواربەر، یەکتربڕ 4 (کـۆن) ← cruciform (بنـەڕەت: لـە *-cruc* ،*crux* لاتـین "خاچ") ۞ 1 حیاتی، خطیر، سرنوشت‌ساز، قاطع 2 مشکل، سخت 3 ضرب‌دری، چلیپایی

**cruciality** /-ʃɪ'alıti/ *noun*

یـــەکلایی کـــەرەوەیی، بڕێنـــەرەوەیێتی، دیاری‌کەرێتی ۞ قاطعیت

**crucially** /-ʃəli/ *adverb*

لەهەموو گرنگ‌تر، هەرەگرنگانە، بەشێوەیەکی هەرەگرنگ: *crucially important* ۞ از همە حساس‌تر، بە طور حیاتی

**cruciate** /'kru:ʃɪət, US -eɪt/ *adjective*

(توێکـاری و رووەکناسـی) چـەپوراستی، چوارپـەر، خـاچی، خـاچئاسـا، شـێوەخـاچ، cross-shaped ،cruciform ۞ چلیپایی

**cruciate ligament** *noun*

بەند یان ئێسک‌بەستی خاچی (هی جومگەی چۆک، ب.ت. anterior cruciate ligament)

۞ رباط صلیبی

**crucible** /'kru:sıbl/ *noun*

1 بۆتـە، تێـساو، دریچـە، مـەنوونی 2 بۆتـەی تـاقی‌کردنـەوە، تـاقی‌کـاری سـەخت، کـووری تاقی‌کردنەوە: *an alliance forged in the crucible of war* ۞ 1 بوتە 2 آزمون دشوار

**crucible steel** *noun*

جۆرێ پۆلای زۆر سەخت ۞ نوعی فولاد

**crucifer** /'kru:sıfə/ *noun*

1 گیاخاچ، رووەکی خاچی 2 خاچ‌هەلگر ۞ 1 صلیب 2 صلیب‌بردار

**cruciferous** /kru:'sıf(ə)rəs/ *adjective*

(رووەکناســی) خــاچی، چوارپــەڕ(ە)، چـەپوراسـتی، سـەربـە یـا ئامـاژە بـە خێـزانی (Cruciferae) cabbage ۞ چلیپایی

**crucifix** /'kru:səfıks/ *noun*

وێنەی مەسیح بەسەر خاچەوە، هێمـای دینی کریستانیەت ۞ صورت مسیح بر صلیب

**crucifixion** /ˌkru:sə'fıkʃn/ *noun*

1 (جـاران) لەخاچ‌دان، بەچوارسنگ‌کێشان، لە چوارمێخـەدان، چوارمێخـە، ئەشـکێل 2 (the Crucifixion) a وێنەی لە خاچ‌دراوی عیسا b مەرگی عیسا بەسەر خاچەوە ۞ 1 تصلیب 2 (با the) شمایل عیسای مطلوب 2 تصلیب عیسی

**cruciform** /'kru:sıfɔ:m, US -fɔ:rm/ *adjective*

خاچی، شێوەخاچ، خاچ‌ئاسا ۞ صلیب‌شکل

**crud** /krʌd/ *noun*

1 (نافـەرمی) تـلتە، خـلتە، زبـل و زال، هـەر مەتریالێکی پیس و نەویستراو 2 قسەی قۆڕ، فلتە، nonsense ۞ 1 آشغال، نخاله 2 چرند

**cruddy** /krʌdi/ *adjective* (cruddier, cruddiest)

(نافەرمی) خراپ، شپرزە، هیچ ۞ عوضی، مزخرف

**crude** /kru:d/ *adjective, noun*

*adj* 1 خاو، نەپالێوراو، پوختەنەکراو، کاڵ‌وکرچ، کـاڵ، ناتـەواو، ناپوخـت، نەگـەیـو، unripe، *crude sugar* ◊ *crude oil/metal* :immature 2 خۆرسـک، سروشـتی 3 ناشـارەزایانە، سەرسەرەکی، ناشییانە 4 سادە، سەرەتایی: *a crude drawing of a face* 5 ناسایی، هیچەکە، بازاڕی 6 بێ‌ڕەوشت، بێ‌ماریفەت 7 قسەلەڕوو، بێ‌پەردە 8 پیس، ناشیرین، هەرزە (شۆخی)، *crude jokes/language* :vulgar 9 (ئامار یان سەرژمێری، ژمارەکان) راست نەکراونەتەوە، خاو *n* (هەروەها crude oil) نەوتی خاو: *50000 barrels of crude* ۞ *adj* 1 خـام، ناپختـه 2 طبیعی 3 ناشیانه 4 ابتدایی، ساده 5 پیش‌پاافتاده، عادی 6 بی‌ادب 7 رک 8 مبتذل 9 کرود، ناویژه *n* نفت خام

**crudely** /kru:dli/ *adverb*

1 بێڕەوشتانە، هەرزانە، بە بێڕەوشتی یان بێئەدەبییەوە 2 بە شێوەیێکی خاو یان پوختەنەکراو 3 بە شێوەیێکی ناشارەزایانە یان ناشییانە، سەرسەرەکییانە ◌ 1 بی‌ادبانە 2 بە طرزی خام، بە طور ناقص 3 بە طور ناشیانەای

**crudeness** /kru:dlinəs/ *noun*
1 سادەیی 2 خاوی، کاڵوکرچی 3 بێڕەوشتی، بێنەزاکەتی، بێئەدەبی ◌ 1 سادگی 2 خامی 3 بی‌نزاکتی

**crude oil** *noun*, also crude
نەوتی خاو یان نەپاڵێوراو ◌ نفت خام

**crudités** /'kru:drteɪ, US ˌkru:dɪ'teɪ/ *noun, pl.*
(فەرەنسی) سەوزەی خاو (یان کاڵ)، سەوزی ◌ سبز خام

**crudity** /'kru:dəti/ *noun, pl.* crudities
1 خاوی، ناپوختی 2 سادەیی 3 بێڕەوشتی، بێماریفەتی: *The crudity of her language shocked him* ◌ 1 خامی 2 سادگی 3 بی‌ادبی

**cruel** /kru:əl/ *adjective* (crueller, cruellest)
1 ستەمکار، زۆردار، بێبەزەیی، دڵڕەق، چەپگەر، زۆردارانە، دڵڕەقانە، درندە: *a cruel dictator* 2 بەژان، دڵتەزێن، جەرگبڕ، سەخت: *a cruel punishment/joke* ◌ 1 ظالم، بی‌رحم، ظالمانە 2 دردناک، مشقت‌بار

**cruelly** /'kru:əli/ *adverb*
بێبەزەییانە، بێڕەحمانە: *I was cruelly deceived* ◌ با بی‌رحمی

**cruelty** /'kru:əlti/ *noun, pl.* cruelties
1 بێبەزەییتی، دڵڕەقی، دڵڕەشی، ستەم، زوڵم، زۆرداری، چەپگەری، درندەیی، توندوتیژی، زەبروزەنگ: *cruelty to animals* 2 خراپ جووڵانەوە، بەدرەفتاری، ئازاردان ◌ 1 بی‌رحمی، قساوت، ظلم، سبعیت 2 سوءرفتار، ایذا

**cruet** /'kru:ɪt/ *noun*
1 شووشە، جێخوێ، جێبیبار (و هەروەها جێی رۆن، سرکە و هتد) 2 (لە کلێسەدا) جێگایێ بۆ هەڵگرتنی مەی و ئاو لە ڕێوڕەسمی شێوی خواوەندیدا ◌ 1 کانتینر کوچک نمک یا فلفل 2 کروئیت

**cruise** /kru:z/ *noun*
گەشتی دەریایی، گەڕانی دەریایی، زەریاگەڕی: *a luxury cruise ship* ◌ گردش دریایی

**cruise control** /kru:z/ *noun*
ئامێر یان دەزگایێکی ئێلیکترۆنی هی ماشێن یان وەسیلەیێ کە ماشێنەکە لە هەمان خێراییدا دەهێڵێتەوە ◌ کروز کونترول

**cruiser** /'kru:zə(r)/ *noun*
1 کەشتی شەڕکەر، کەشتی جەنگی 2 بەلەمی رابواردن 3 (ئافەرمی، ئەمریکا) ماشێنی چەرخەچی ◌ 1 رزمناو 2 قایق تفریحی 3 اتومبیل گشتی

**cruiserweight** = light heavyweight

**cruising speed** *noun*
باشترین خێرایی ◌ سرعت بهینە

**cruise missile** *noun*
مووشەکی کرووز یان ئاراستەکراو (تزمەفڕ) ◌ موشک کروز

**cruller** /'krʌlə/ *noun*
جۆرێ کەیکی چکۆلانە ◌ کرولر

**crumb** /krʌm/ *noun*
1 ورکەنان، ڕیزەنان 2 وردە، ورکە 3 هەویری نێوەڕاستی نان 4 ریزە، تۆزقاڵ، نیسکێ 5 مرۆی قێزەون و بێنرخ، هیچوپووچ ◌ 1 خردەنان 2 خردە 3 خمیر وسط نان 4 ذره، چکە 5 آدم نفرت‌انگیز و بی‌ارزش

**crumble** /'krʌmbl/ *noun*
کرامبێل (جۆرێ خۆراک) ◌ کرامبل

**crumbly** /'krʌmbli/ *adjective* (crumblier, crumbliest), *noun* (*pl. crumblies*)
*adj* وشک، زووشکاو، (زوو)هەڵوەریو، توورت، ناسک: *crumbly soil/cheese* *n* (ئافەرمی و بەشۆخی) بنیادەمی پیر (crumbliness *n*) ◌ *adj* ترد، خشک *n* آدم مسن

**crumbs** /krʌmz/ *interjection*
تەح، پیاح، پەح (جوان‌دەربڕی بۆ *Christ*): *Oh crumbs! Is that the time?* ◌ ای وای

**crumhorn** = krum(m)horn

**crummy** /'krʌmi/ *adjective* (crummier, crummiest)
بێنرخ، خراپ، هیچ(ەکە)، بێبایەخ، ئایەخ: *Most of his songs are pretty crummy* ◌ بی‌ارزش، افتضاح

**crump** /krʌmp/ *noun*
خرموهۆڕ، خرمەخرم، خرمە، کرمەکرم، کرمە ◌ قرچ‌قروچ

**crumpet** /'krʌmpɪt/ *noun*
1 کرامپێت (= کەیکێکی پان و خڕ) 2 چەقالە، جەرگ 3 (کۆن و ئافەرمی، لە بریتانیا) سەری مرۆڤ، سەلک، کەللە ◌ 1 کرامپت 2 تیکە 3 کلە

**crumple** /krʌmpl/ *noun*
گرمۆلە، گلۆلە، چرچ‌هەڵاتوو، چرچ‌ولۆچی، قەد (crumply *adj*) ◌ مچالە، چین

**crumpled** *adjective*
گرمۆلە، گلۆلەکراو، لوولکراو، هەڵپساوتە، هەڵقرچاو، چرچ‌هەڵاتوو: *crumpled clothes/papers* ◊ *A crumpled figure lay motionless in the doorway* ◌ مچالە

**crumple zone** *noun*
ناوچەی گرمۆلە: بەشێکی ماشێن کە وا داڕێژراوە کە زوو گرمۆلە بێ (ئەگەر شتێ رووبدا تا سوارەکانی نێو ماشێن بپارێزرێن) ◌ کرامپل زون

**crunch** /krʌntʃ/ *noun*
1 خرم‌وهوڕ، خرمه‌خرم، خرمه، کرمه‌کرم، خرچه‌خرچ: *the crunch of feet on snow* ◊ *The car drew up with a crunch of gravel* 2 (نافه‌رمی) کاتی بڕیاردان، وه‌ختی ده‌س‌تیدان 3 = sit-up ◊ 1 قرچ‌قروچ 2 وقت عمل

**cruncher** *adjective*
(نافه‌رمی) کاتی بڕیاردان ◊ وقت عمل

**crunchy** *adjective* (crunchier, crunchiest)
ناسک، تورت، قرچ، قرچۆک، قرپ: *a crunchy salad* ◊ ترد

**crupper** /'krʌpə/ *noun*
1 قوش، قوشقونه، قوشقن، پاردو، پالم، کلک‌گیر، ئاشرمه، هێنشرمه، پالتاو؟ 2 ته‌ڕماڵ، که‌فه‌ڵ، پاشه‌ڵی چاره‌وێ یا ئه‌سپ ◊ 1 پاردم 2 کفل اسب

**crural** /'krʊər(ə)l/ *adjctive*
(توێکاری و گیانه‌وه‌رناسی) لاقی، لنگی، پایی، لوولاکی، رانی، سه‌ربه ران (بنه‌ڕه‌ت: له *cruralis* لاتین، له *crur- ،crus* "leg") ◊ ساقی، وابسته به ران

**crusade** /kru:'seɪd/ *noun*
1 شه‌ڕی نێوان وڵاتانی کریستانی ئه‌وروپایی به‌دژی مسوڵمانان له سه‌ده‌کانی ناوه‌ڕاستدا، شه‌ڕی خاچ‌په‌رسته‌کان یان خاچ 2 شه‌ڕ، شالاو، خه‌بات، چالاکی، هه‌ڵمه‌ت (بنه‌ڕه‌ت: له *croisade* فه‌ڕه‌نسی و *cruzado* سپانیایی، هه‌ردووکیان له ئه‌نجامدا له‌سه‌ر بنه‌مای *crux*، *cruc-* لاتین "خاچ" "cross") ◊ 1 جنگ صلیبی 2 جهاد، مبارزه، پیکار

**crusader** /kru:'seɪdə(r)/ *noun*
1 شه‌ڕکه‌ر یان شه‌ڕڤانی خاچ‌په‌رسته‌کان 2 خه‌بات‌کار، کۆڵنه‌ده‌ر، شالاوکار: *moral crusaders* ◊ 1 جنگجوی صلیبی 2 مجاهد، مبارز

**cruse** /kru:z/ *noun*
(کۆن) کوزوو، کاشی، جه‌ڕه (بۆ ئاو و رۆن، ئه‌ڵمانی بنه‌ڕه‌ت) ◊ کوزه

**crush** /krʌʃ/ *noun*
1 کۆمه‌ڵ، ده‌سته، گروپ، خه‌ڵک 2 چڕه‌به‌ندان، قه‌ره‌باڵغی، شانه‌چرکێ، پاله‌په‌ستۆ، شانه‌ترنجێ، شلووقایی، تێ‌ڕژاوی، گوڕمۆره، جه‌نجاڵ، ئاپۆره 3 خۆشاو، شه‌ربه‌ت 4 مایه‌دانان، خاترویستن 5 حه‌ز یان دڵداری کورت‌ماوه 6 ئاوی میوه، خۆشاو ◊ 1 جمعیت 2 ازدحام 3 شربت 4 خاطرخواهی 5 عشق زودگذر 6 افشره

**crush barrier** *noun*
په‌رژین یان دیواری کۆنترۆڵ، په‌رژینی پارێزه ◊ نرده‌ی کنترل

**crushed** *adjective*
وردوخاش‌کراو، هه‌ڵگلۆفاو، فلیقاته، داپلۆساو، داپلۆخاو، فلیقاو، پلیشاو، پانه‌وه‌بوو، په‌ره‌خاندی، گرمۆڵه‌کراو، په‌ڵخورد (ده‌غڵ) ◊ مچاله، له و لورده، لهیده

**crushed stone** *noun*
به‌ردی شکاو، به‌ردی وردوخاش‌کراو (ڕێگاوبان) ◊ سنگ شکسته

**crusher** /'krʌʃə(r)/ *noun*
1 وردوخاش‌که‌ر، تێک‌شکێنه‌ر 2 ده‌زگاری هارین، هاره(ر): *a garlic crusher* ◊ 1 خردکننده 2 ماشین خردکننده

**crushing** /'krʌʃɪŋ/ *noun*
1 کاری، گوچک‌بڕ، کاریگه‌ر، سه‌خت: *a crushing defeat in the election* 2 تێک‌شکێنه‌ر، وردوخاش‌که‌ر 3 توند، وه‌ڵامی ده‌م‌نه‌گه‌ڕ ◊ 1 قاطع 2 خردکننده 3 دندان‌شکن

**crushingly** /'krʌʃɪŋli/ *adverb*
کاریگه‌رانه، به‌شێوه‌یه‌کی سه‌خت ◊ قاطعانه

**crush resistant** *noun*
زه‌ربه‌گیره‌وه، دژی پیاکێشان ◊ ضد ضربه

**crust** /krʌst/ *noun*
1 روو، به‌ر (نان)، له‌ته نان، تێکه نان (وشک)، پرزه (نان): *sandwiches with the crusts cut off* 2 توێژ، توێکڵ، توێ، رووی ره‌ق، رووڕه‌ق، قاوغ، قاپیلک، سه‌خته‌ڕوو: *a thin crust of ice* ◊ *the earth's crust* 3 (مه‌ی و هتد) خڵته، نیشتوو 4 قه‌تماغه، ره‌قیته، کرێژ 5 به‌ڵخ (crustless *adj*) ◊ 1 رویه، تکه نان 2 لایه، پوسته 3 رسوب 4 کبره 5 جرم

**Crustacea** /krʌ'steɪʃ(ə)/ *noun, pl.*
(گیانه‌وه‌رناسی) قرژاڵیان، قاپیلک‌داران، توێکڵ‌داران، پێسره‌قان، تیره‌قرژاڵ، قرژاڵیان، crab، lobster، shrimp، woodlouse و barnacle ده‌گرێته‌وه (لاتینی نوێ، له *crusta* (بڕوانه crust) ◊ سخت‌پوستان

**crustacean** /krʌ'steɪʃn/ *noun, adjective*
(گیانه‌وه‌ری) له تیره‌ی قرژاڵ، گیانه‌وه‌ری قاپیلک‌دار یان توێکڵ‌دار، جانه‌وه‌ری پێسره‌ق ◊ (جانوری) از خانواده‌ی سخت‌پوستان

**crustaceous** /krʌ'steɪʃəs/ *adjective*
قاپیلک‌دار، توێکڵ‌ئاسا، قاوغ‌ئاسا، پێکهاتوو له قاپیلک، قاپیلکی ◊ دارای پوست، پوست‌مانند

**crustal** *adjective*
توێکڵی، توێژی ◊ پوسته‌ای

**crustal movement** *noun*
بزووتنی توێکڵی، جووڵه‌ی توێکڵی ◊ حرکت پوسته‌ای

**crusted** /'krʌstɪd/ *adjective*
1 داپۆشراو له 2 خاوه‌نی توێژاڵی (سه‌خت یان ره‌ق) له ◊ 1 پوشیده از 2 دارای قشری (سخت) از

**crustily** /'krʌstɪli// *adverb*
مرومۆچانه، به توندی، رووتاڵانه ◊ با بدعنقی

**crustiness** /'krʌstinəs// *noun*
1 پێسته‌پێسته‌یی، توێ‌توێ‌بوون، توێژاڵ‌توێژاڵی

2 رووگرژی، مرومۆچی، توندی، رووتالی ◇ 1 پوستەپوستەشدگی 2 بدعنقی، تندمزاجی

**crust of earth** *noun*

توێکڵی زەوی ◇ پوستەی زمین

**crustose** /'krʌstəʊs/ *adjective*, compare foliose, fruticose

(رووەکناسی، lichen یان alga) لە crust ی پێکهاتووە یان شێوەی ئەو دەدا (بنەڕەت: لە لاتین، لە *crusta* (پروانە crust) *crustosus* ◇ کراستوس، کروستوس

**crusty** /'krʌsti/ *adjective* (crustier, crustiest)

1 برژاو (نان): *crusty bread* 2 پێستەپێستە، توێتوێ، توێژاڵتوێژاڵ 3 رووگرژ، مرومۆچ، توند، ئاڵەتی، هەڵتوز، رووتاڵ، کۆنەپەرست: *a crusty old man* ◇ 1 برشته 2 پوستەپوستە 3 بدعنق، تندمزاج، ارتجاعی

**crutch** /krʌtʃ/ *noun*

1 شەقە، چێوشەقە، دارشەق، گۆچان 2 پاڵپشت، پشت، پەنا، پشتوپەنا 3 ناوگەڵ، گەڵ، ناوڵنگ، ناوران 4 خشتەک ◇ 1 چوب زیر بغل، عصا 2 تکیەگاە، پناە 3 محل اتصال دو ران 4 خشتک

**crux** /krʌks/ *noun, pl.* cruxes or cruces /'kru:si:z/

1 کاکڵ (بابەت یان پرسێ)، نەسڵ، پوختە 2 پرسی ئاڵۆز یان دژوار، مەتەڵ 3 (ئەستێرەوانی، Crux) خاچی باشووری ◇ 1 اصل 2 مسالەی بغرنج 3 (اخترشناسی) صلیب جنوبی

**cruzeiro** *noun, pl.* cruzeiros

کرووزارو (= یەکەی پارەی برێزیل، کورتەکەی cr) ◇ کروزرو

**cry** /kraɪ/ *noun, pl.* cries

1 هەرا، نەڕە، گوڕە، بانگ، گازی، هاوار، زریوەزریو، بۆڕە، قاو، قیژە، زیکە، جیکە، زیقە 2 گریان، ماوەی گریان 3 لووره 4 جاڕ، بانگەواز 5 دروشم 6 داخوازی، داوا 7 سکاڵا، شکات ◇ 1 فریاد، نعرە، جیغ 2 گریە، مدت گریە 3 زوزە 4 جار 5 شعار 6 درخواست 7 شکایت

**cry-baby** /'kraɪbeɪbi/ *noun, pl.* cry-babies

منالی گرینۆک، زووقن، گرەزۆک، نووکن ◇ بچەی نقنقو

**crying**[1] /'kraɪɪŋ/ *adjective*

پێویست، ئاشکرا، روون، بەرچاو، زەق: *a crying need* ◇ مبرم، واضح، آشکار

**crying**[2] /'kraɪɪŋ/ *noun*

گریان: *the -ng of terrified children* ◇ گریە

**cryo-** /'krʌɪəʊ/ *prefix*

پێشگر: ساردی، سەرما، بەستن: *cryosurgery*، *cryonics*، *cryogen* (لە *kruos* یۆنانییەوە "frost") ◇ پیشوند: سرما، برودت، انجماد

**cryobiological** *adjective*

سەربە سەرمازیندەناسی، سەربە کرایۆبایۆلۆژی ◇ وابستە بە کریوبیولوژی

**cryobiologist** *noun*

سەرمازیندەناس، کرایۆبایۆلۆژیست ◇ کریوبیولوژیست

**cryobiology** *noun*

سەرمازیندەناسی، کرایۆزیندەناسی، لقێ لە زیندەناسی کە باسی تایبەتمەندی زیندەوەرەکان لە تێمپراچێری خواردا دەکا ◇ کریوبیولوژی

**cryogen** /'krʌɪə(ʊ)dʒ(ə)n/ *noun*

کەرەسە یان مەتریاڵی سەرماپێکهێن (یان سەرماساز) ◇ کریوژن

**cryogenic** /ˌkraɪə'dʒenɪk/ *adjective*

1 کرایۆژێنیک 2 سەرماپێکهێن، سەرماساز ◇ 1 کریوژنیک 2 سرمازا

**cryogenics** /ˌkraɪə'dʒenɪks/ *noun, pl.*

سەرماناسی (خوێندنەوەی زانستی بەکارهێنانی تێمپراچێری زۆر نزم) ◇ سردیشناسی

**cryolite** /'krʌɪəlʌɪt/ *noun*

بەردەسەرما، بەرەدسەهۆڵ (فلۆرایدی سۆدیۆم و ئالومینیۆمی تیایە، fluoride of sodium ب.ت. لە گرینلەند Greenland دۆزراوەتەوە و جاران وەک سەرچاوەی ئالومینیۆم بەکاردێترا) ◇ کریولیت

**cryometer** *noun*

سەرماپێو، ساردیپێو ◇ سردیسنج

**cryonic** *adjective*

سەربە یان پێوەندی بە کرایۆنیکەوە هەیە ◇ وابستە بە کریونیک

**cryonics** /krʌɪ'ɒnɪks/ *noun, pl.*

بەست(اند)نی کەسێ کە لەبەر نەخۆشییێ مردووە و بە هیوای ژیاندنەوەی ئەو کەسە کاتێ لە داهاتوودا چارەسەرییێ بۆ ئەو نەخۆشییێ دەدۆزرێتەوە ◇ کریونیک

**cryophilic** *adjective*

سەرمادۆست، سەرماخواز، سەرماپەسند، سەرماحەز ◇ سرمادوست

**cryophilous** *adjective*

سەرمادۆست، سەرماخواز، سەرماپەسند، سەرماحەز ◇ سرمادوست

**cryophyte** *noun*

سەرماگیا، سەرمارووەک ◇ سرمارست

**cryoplankton** *noun*

سەرماسەراوەکی، سەرناوەکی ئاوی سارد یان جەمسەران، سەراوەکی سەرماخواز: ئەو بوونەوەرانەی کە ماوەیێکی زۆری ساڵ بە شێوەی بەستوو لە بەفردا دەژین، وەک زۆر لە قەوزەکان، نێماتۆدەکان و هتد ◇ سرمادروازی، کریوپلانکتون

**cryopreservation** *noun*

(بە)سەرماپارێزی ◇ حفاظت انجمادی

**cryoprotectant** *noun*
(کارنەندامناسی) دژەبەست، سەرماپارێز: ماکێ کە بەرلە بەستنی شانەیێ دەکا یان بەرگیری لە زیانپێگەیشتن بە خانەکان بە درێژایی بەستن دەکا ۞ کریوپروتکتانت

**cryoscope** *noun*
سەرمابین، بەستنپێو ۞ کریوسکوپ، انجمادسنج

**cryoscopic** *adjective*
سەربە سەرمابینی یا بەستنپێوی ۞ وابستە بە کریوسکوپی یا انجمادسنجی

**cryoscopy** *noun*
سەرمابینی، بەستنپێوی ۞ کریوسکوپی، انجمادسنجی

**cryostat** /'krʌɪə(ʊ)stat/ *noun*
سەرماڕێکخەر ۞ سرماپا

**cryostatic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە سەرماڕێکخەرەوە هەیە ۞ وابستە بە سرماپا

**cryosurgeon** *noun*
سەرمانەشتەرگەر، کریۆسێرجیۆن ۞ کریوسرجیون

**cryosurgery** *noun*
سەرمانەشتەرگەری: نەشتەرگەرییێ کە لەودا شانەی نائاسایی یان نەخۆش (وەک تومۆر یان wart) بەهۆی بەستنەوە لادەبرێ یان لەناو دەبرێ (وەک بە نایترۆژێنی شلە) ۞ کریوسرجری

**cryosurgical** *adjective*
سەربە یا پێوەندی بە کریۆسێرجێری‌یەوە هەیە ۞ وابستە بە کریوسرجری

**cryotherapy** *noun*
چارەسەری هێندێ نەخۆشی بە سەرمایێکی یەکجار زۆر ۞ سرمادرمانی

**crypt** /krɪpt/ *noun*
1 ژێرخان یان ژێرزەمینی کلێسە 2 ئەشکەوت 3 (توێکاری) بۆشایی لوولەیی ۞ 1 سرداب کلیسا 2 غار 3 حفرەی غدەای

**crypt(o)-** /'krɪptəʊ/ *prefix*
پێشگر: نهێنی، نەهێنی، پەنامەکی، داپۆشراو، ڕەمزی (بنەڕەت: لە *kruptos* یۆنانی‌یەوە "hidden") ۞ پیشوند: مخفی، نهان، رمزی

**cryptanalysis** *noun*
1 شێوە و ڕەوت و ڕێبازی دۆزینەوە یان لێکدانەوە و وەرگێڕانی نووسراوەی نهێنی یان ڕەمزی 2 زانست یان لێکۆڵینەوەی ئەو شێوە و ڕێبازانە ۞ 1 کشف نوشتەی رمزی 2 کریپتوآنالیز

**cryptanalytic** *adjective*, also cryptanalytical
سەربە cryptanalysis ۞ وابستە بە کریپتوآنالیز

**cryptic** /'krɪptɪk/ *adjective*, also cryptical
1 نهێنی، نەهێنی، سڕاوی، ڕازاوی، نادیار، ڕەمزی، شاراوە، secret، occult، mysterious: *cryptic messages* 2 (زیندەناسی، ڕەنگ و هتد) دەتوانێ بیگۆڕێ، دەتوانێ بەپێی هەلومەرجی ژینگە دەربێ یان بگۆڕدرێ: *cryptic animals* ۞ 1 رمزی، سری 2 کریپتیک

**cryptically** /-kli/ *adverb*
نهێنی‌یانە، بەشێوەیەکی شاراوە یان نەهێنی ۞ بە طور مرموزی

**crypto** *noun, pl.* cryptos
ئەندامی نهێنی ۞ عضو سری

**cryptococcal** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە کریپتۆکۆکۆسیسەوە هەیە ۞ وابستە بە کریپتوکوکوسیس

**cryptococcosis** /ˌkrɪptə(ʊ)kə'kəʊsɪs/ *noun, pl.* cryptococci
جۆرێ نەخۆشی کە بەهۆی فۆنگۆسی Cryptococcus neoformans تووش دەبێ، ب.ت. دەزگای دەماری و سی‌یەکان ۞ کریپتوکوکوسیس

**cryptocrystalline** *adjective*
کریپتۆکریستالین، کریپتۆکریستالی: خاوەنی پێکهاتەی بلووری یان کریستالی سابمایکرۆسکۆپی یان ژێرووردبینی ۞ کریپتوکریستالین

**cryptogam** /'krɪptə(ʊ)gam/ *noun*
(ڕووەکناسی) گیا یان ڕووەکی بێگوڵ، گیانەهێنبەر (وەکوو سەرەخس fern، قەوزە moss، کرێژەبەرد lichen و هتد) ۞ گیاه نهانزاد

**Cryptogamia** *noun, pl.*
بێگوڵان، بێگوڵەکان، نەهێنبەرەکان ۞ نهانزادگان

**cryptogamic** *adjective*, also cryptogamous
(سەربە) بێگوڵ یان نەهێنبەر ۞ (وابستە بە) نهانزاد

**cryptogram** /'krɪptə(ʊ)gram/ *noun*, also cryptograph
نووسراوە یان پەیامی نهێنی، نەهێننووسراوە ۞ رمزنگاشت

**cryptographer** *noun*
کۆدنووس، نهێنی‌نووس، نەهێننووس ۞ رمزنگار

**cryptographic** *adjective*
سەربە کۆدنووسی، سەربە نهێن(ی)نووسی ۞ وابستە بە رمزنگاری

**cryptography** /krɪp'tɒgrəfi, US -'ɑːg-/ *noun*
کۆدنووسی، نهێنی‌نووسی، نەهێننووسی ۞ رمزنگاری

**cryptological** *adjective*
سەربە نەهێنی‌ناسی، سەربە کۆدناسی ۞ وابستە بە کریپتولوژی

**cryptologist** *noun*
نەهێنی‌ناس، کۆدناس ۞ کریپتولوژیست

**cryptology** *noun*
نەهێنی‌ناسی، کۆدناسی ۞ کریپتولوژی

**cryptomeria** /ˌkrɪptə(ʊ)ˈmɪərɪə/ *noun*
بەشەگومە؟: داریکی سنەوبەری دریژ، رەسەنی چین و ژاپۆن [*Cryptomeria japonica*] ◌ کریپتومریا

**cryptomerism** *noun*
نەهێنپارژەیی، نەهێنپاری ◌ کریپتومریسم

**cryptomonad** *noun*
نەهێنگیا: هەریەک لە قەوزەکانی لقی Cryptophyta کە زۆرتر دوو شیلاقەیان flagellum هەیە ◌ کریپتوموناد

**cryptonym** /ˈkrɪptənɪm/ *noun*
ناوی نهێنی، نەهێنناو ◌ نام سری

**cryptonymous** *adjective*
خاوەنی ناوی نهێنی، خاوەن نەهێنناو ◌ دارای نام سری

**cryptophyte** = cryptomonad

**cryptophytic** *adjective*
نەهێنگیایی، سەربە کریپتۆمۆناد cryptomonad ◌ وابستە بە کریپتوموناد

**cryptorchid** /ˌkrɪpˈtɔːkɪd/ *noun, adjective*
(پزشکی، کەسیکی) نەهێنباتوو، کەسێ کە تووشی کریپتۆکیسیزم بووە ◌ نهانبیضە، کریپتورکید

**cryptorchisism** *noun*, also cryptorchism
(پزشکی) نەهێنباتوویی، کریپتۆرکیسیزم: دۆخێ کە لەودا یەک یان هەردوو باتوو (بە ئاسایی) لە زگەوە نایەنە نێو باتوودان scrotum، نەهاتنەخوارەوەی یەک یان هەردوو گون لە نێو زگەوە بۆ نێو گوندێن (لە سەروبەندی هەڵدانی ئاولەمەیی‌دا) (بنەرەت: لە -crypto + *orkhis*, -*orkhid* یونانی "testicle" + ism-) ◌ نهانبیضگی

**cryptosporidiosis** *noun*
جۆرێ نەخۆشی ریخۆڵەیی کە لە ئەنجامی cryptosporidiumەوە تووش دەبێ و دەبێتەهۆی زگچوون و رشانەوە ◌ کریپتوسپوریدیوز

**cryptosporidium** *noun*
جۆرێ سەرەتاژیاوی coccidianی مشەخۆر کە لە کۆئەندام یان دەزگای ریخۆڵەی زۆر برپرەدارەوە دۆزراوەتەوە ◌ کریپتوسپوریدیوم

**Cryptozoa** *noun, pl.*
نەهێنژییان ◌ کریپتوزوآ

**cryptozoic** *adjective*
نەهێنژی: ژیوارکردن لە شوێنە شاراوە یان لاتەریک و دوورەپەریزەکان ◌ کریپتوزوئیک

**cryptozoological** *adjective*
سەربە نەهێنگیانەوەرناسی یا کریپتۆزوولۆژی ◌ وابستە بە کریپتوزولوژی

**cryptozoologist** *noun*
نەهێنگیانەوەرناس، کریپتۆزوولۆژیست ◌ کریپتوزولوژیست

**cryptozoology** *noun*
نەهێنگیانەوەرناسی، گەران بە دوای ئەو گیانەوەرانەی کە بوونیان روون نەبۆتەوە (وەکوو Loch Ness minster) ◌ کریپتوزولوژی

**crystal** /ˈkrɪstl/ *noun, adjective*
*n* 1 بلوور، تەورک؟، چلوورە، کریستاڵ 2 قاپوقاچاخی بلوورین 3 شووشەی سەعات *adj* بلوورین، تەورکین، رووتەنک، روون، رۆشن (بنەرەت: ئینگلیسی کۆن (ئاماژە بە سەهۆڵ یان کانێکی وا) لە *crystal* فەرەنسی کۆن، لە *crystallum* لاتین، لە *krustallos* یونانی "crystal ice") ◌ *n* 1 بلور 2 ظروف کریستال 3 شیشەی ساعت *adj* بلورین، فرانما

**crystal ball** *noun*
گۆی بلوورین یان کریستاڵی (لە فاڵگرتنەوەدا) ◌ جام جهان‌نما

**crystal clear** *adjective*
تەواو رۆشن، ئاشکرای ئاشکرا، بە تەواوەتی ئاشکرا یان دیار ◌ کاملاً واضح، کاملاً هویدا

**crystal defect** *noun*
ناتەواوی بلووری، دیفیکت یان کەموکورتی کریستاڵی ◌ نقص بلور

**crystal energy** *noun*
وزەی بلوور یان کریستاڵی ◌ انرژی بلور

**crystal gazing** *noun*
روانینی گۆی بلوورین، داهاتووبینی، پێشبینی‌کردنی رووداوەکانی داهاتوو ◌ جام جهان‌نمانگری، پیشگویی حوادث آینده

**crystal growth** *noun*
هەڵدان یا گەشەی کریستاڵ، هەڵدانی بلوور، گەشەی بلوور ◌ رشد بلور

**crystal lattice** *noun*
توری بلوور یان کریستاڵ ◌ شبکەی بلور

**crystalline** /ˈkrɪstəlaɪn/ *adjective*
بلوورین، بلووری، کریستاڵی، چلوورەیی، رووتەنک، روون، رۆشن، وەکوو بلوور، تەورکئاسا، بلوورئاسا ◌ بلوری، بلورین، شفاف، مثل بلور

**crystalline lens** *nonu*
هاوێنەی بلووری، لێنزی کریستاڵی یان بلووری ◌ لنز کریستالی

**crystallinity** *noun*
روونی، رووتەنکی، رۆشنی ◌ شفافیت

**crystallite** *noun*
وردەبلوور، کریستالیت ◌ کریستالیت

**crystallization** /ˌkrɪstəlaɪˈzeɪʃn, US -ləˈz-/ *noun*
کریستاڵیزەیشن، بلوورین، بەتەورکبوون، تەورکان ◌ تبلور

**crystallized** /ˈkrɪstəlaɪzd/ *adjective*
1 بلووریتراو، بلوورە، بەتەورکبوو، تەورکێنراو،

چلووره‌به‌ستوو 2 شه‌کرپێوه‌کراو، شه‌کراوی (میوه) ۞ 1 متبلورشده 2 شکراندود

**crystallographer** /ˌkrɪstəˈlɒgrəfə(r), US -ˈlɔːg-, -ˈlɑːg-/ *noun*

بلوورناس، بلووره‌وان، تەورکناس، کریستاڵناس ۞ بلورشناس

**crystallographic** *adjective*

سه‌ربه بلوورناسی، سه‌ربه کریستاڵناسی ۞ وابسته به بلورشناسی

**crystallography** /ˌkrɪstəˈlɒgrəfi, US -ˈlɔːg-, -ˈlɑːg-/ *noun*

بلوورناسی، بلووره‌وانی، تەورکناسی، کریستاڵناسی ۞ بلورشناسی

**crystalloid** *adjective*

بلوورئاسا، شێوتەورک، تەورکئاسا ۞ بلورنما

**crystal set** *noun*

جۆرێ دەزگای رادیۆی کۆن ۞ کریستال ست

**crystal structure** *noun*

پێکهاته‌ی کریستاڵی یان بلوور ۞ ساختار بلور

**crystal system** *noun*

سیستم کریستاڵی، ریکخسته‌ی بلوور یان کریستاڵی ۞ دستگاه بلور

**crystal water** *noun*

ئاوی بلوور یا کریستاڵی، بلووراو ۞ آب کریستالی

**Cs** symb. the chemical element cesium

**csardas** /ˈtʃɑːdæʃ, US ˈzɑːdɒs/ *noun*, also czardas

جۆرێ هەڵپەڕکێی هەنگاریایی، بە دەسپێکی ئارام و تەواوبوونێکی کرژ و توندەوە ۞ چارداش

**CSE** *abbreviation* Certificate of Secondary Education

سی‌ئێس‌ئی (بڕوانامەیەکی خوێندنگای ئامادەیی لە سیستمی پەروەردەی بریتانیای پێشوو و هەریەک لە تاقی‌کاری‌یەکانیشی) ۞ سی‌اس‌ای

**C-section** = Caesarean

**CS gas** *noun*

گازی فرمێسک‌رێژ یا سووتێنەرەوە (بنەرەت: لە ناوی کیمیازانانی ئەمریکایی Ben B. *Corson* و Roger W. *Stoughton*) ۞ گاز سوزآور

**CST** /ˌsiː es ˈtiː/ *abbreviation* Central Standard Time

کاتی خۆجێیی نەیالەتە ناوەندی‌یەکانی ئەمریکا (ئەو کاتەی کە نێوان درەنگانی ئۆکتۆبر و سەرەتای ئاپریل لە هەرێمە ناوەندی‌یەکاندا بەکاردێتێ، 6 سەعات زووتر لە کاتی گرینیچە) ۞ سی‌اس‌تی

**ct** *abbreviation* carat

**ct** *abbreviation* cent(s)

**ctendium** /tɪˈnɪdɪəm/ *noun*, *pl.* ctenidia /-dɪə/

شانۆچکە: ئەندامی هەناسەی شانەئاسای لەش‌نەرمەکان (بنەرەت: لاتینی نوێ، لە *ktenidion* یۆنانی، چکۆلێنراوی *kteis* *kten-* "شانە comb") ۞ تینیدیوم

**ctenoid** /ˈtiːnɔɪd/ *adjective*

(گیانەوەرناسی، لەبارەی پوولەکەی ماسی‌یەکانەوە) شانەیی، شانەئاسا، شانۆید (شانە + -oid)، وەک هی زۆر ماسی ئێسکن‌دا (بڕوانە ganoid و placoid) ۞ تینوید

**Ctenophora** /tiːˈnɒfərə, US tɛ-/ *noun, pl.*

(گیانەوەرناسی) شانەداران، شانەوەران: لقێکی چکۆلەی بێ‌بڕبڕە ئاوی‌یەکان کە comb jellyیەکان (یا ctenophore) دەگرێتەوە ۞ تینوفورا

**ctenophore** /ˈtiːnəfɔː , US ˈtɛ-/ *noun*, also comb jelly

گیانەوەری شانەدار یان شانەوەر ۞ تینوید

**cu** *abbreviation* cubic

**Cu** symb. the chemical element copper (from late Latin cuprum)

**cuatro** /ˈkwatrəʊ/ *noun*

چوارە: گیتارێکی چکۆلانە بە چوار (یان پێنج) ژێی تاق یان جووت، لە ئەمریکای لاتین و موسیقای خۆماڵی کاریبیەن بەکاردێتێ ۞ کواترو

**cub** /kʌb/ *noun*

1 تولە، تووتک، کودی، بەچکە، بێچوو، تێژک (شێر، رێوی، ورچ و هتد): *a lioness guarding her cubs* 2 شێرەمناڵ: (هەروەها Cub Scout) ئەندامی ریکخراوەی پێشەنگایەتی شێرەمناڵان: *to join the Cubs* 3 لاوی بێ‌شەرم و رووودار ۞ 1 تولە 2 شیربچە، عضو سازمان ساب سکوت 3 جوان گستاخ

**cubage** *noun*

جێگا یان فراوانی سێ‌جا ۞ کوباژ

**Cubalibre** *noun*

جۆرێ کوکتایل لە ram، ئاوی لیمۆترش و کۆلا cola ساز دەبێ (سپانیایی: کوبای ئازاد)۞ کوبالیبر

**Cuban** /ˈkjuːbən/ *noun, adjective*

*n* خەڵکی کووبا، کووبایی *adj* سەربە کووبا، کووبایی ۞ کوبایی

**cubature** /ˈkjuːbətʃə/ *noun*

دیاری‌کردنی بارستایی شتێ ۞ تعیین حجم چیزی

**cubby-hole** /ˈkʌbihəʊl, US -hoʊl/ *noun*, also cubby

جێگای تەنگ، کون ۞ سوراخ

**cube** /kjuːb/ *noun*

1 خشتە، شەش‌پاڵوو، سێ‌جا 2 لەت (شەش‌پاڵوویی) 3 چوارگۆشە، میسری، کولۆ (قەند) ۞ 1 مکعب، توان سه 2 تکه 3 حبه (قند)

**cubeb** /ˈkjuːbɛb/ *noun*

1 کەبابە، دەوەنێکی گەرمێنان، لە خێزانی

pepper [*Piper cubeba* (ئاسیا) و جۆرەکانی تر] 2 بەری نەگەیشتووی وشکەوەبووی ئەم دەوەنە، بۆ دەرمان یان تامخۆش کردنی جگەرە بەکاردێتریَ ۞ کبابەچینی

**cubed** *adjective*

لە رەگی سێجا دراو ۞ بە توان سە رسیدە

**cube root** *noun*

رەگی سێیەم، رەگی سێجا (رەگی سێیەمی 64 یانی 4 (4×4×4 =64) ۞ ریشەی سوم

**cubic** /'kju:bɪk/ *adjective*

شەشپالوو، شەشپالوویی، سێجایی، خشتەکی ۞ مکعب، مکعبی

**cubical** *adjective*

شەشپالوویی، سێجایی، خشتەکی، شەشپالووئاسا، خشتەئاسا ۞ مکعبی، مکعب‌شکل

**cubical lattice** *noun*

تۆڕی خشتەکی ۞ شبکەی مکعبی

**cubical number** *noun*

ژمارەی خشتەکی ۞ عدد مکعبی

**cubic centimetre** *noun*

سانتیمیتری سێجا ۞ سانتی‌متر مکعب

**cubicle** /'kju:bɪkl/ *noun*

دیوی خۆگۆڕین، ژووروچکە، خەوتنگا، خەوتنگە، جێخەو ۞ رخت‌کن، اتاقک، خوابگاه

**cubic metre** *noun*

میتری سێجا ۞ متر مکعب

**cubiform** /'kju:bɪfɔ:rm/ *adjective*

شەشپالوو، شەشپالوویی، سێجایی، خشتەکی ۞ مکعب

**cubism** /'kju:bɪzəm/ *noun*

کوبیزم (شێواز و بزووتنەوەیەکی هونەری لە سەرەتای سەدەی 20دا کە لەودا بابەت و شت و خەڵک بە شێوەی ئەندازەیی دەخرێنەڕوو و لە زۆر لا و گۆشەوە پیشان دەدرێن) ۞ حجم‌گری

**cubist** /'kju:bɪst/ *noun*

کوبیست ۞ کوبیست

**cubistic** *adjective*

کوبیستی ۞ کوبیستی

**cubit** /'kju:bɪt/ *noun*

نیوگەز، لاگەز، ئانیشکە؟: پێوانەیێکی کۆن بۆ درێژایی، نزیک بە درێژایی قۆڵ (بنەڕەت: ئینگلیسی نیوەڕاست، لە *cubitum* لاتین "cubit ,forearm ,elbow") ۞ ذراع

**cubital** /'kju:bɪt(ə)l/ *noun*

1 قۆڵی 2 (مێروناسی) باسکی، قۆڵی ۞ 1 ارجی 2 کیوبیتال

**cubitus** /'kju:bɪtəs/ *noun*

قۆڵ، ئەشک ۞ ارج

**cuboid** /'kju:bɔɪd/ *adjective, noun*

*adj* خشتەئاسا، شەشپالوویی، مۆرەیی *n* 1 خشتە، شەشپالوو، سێجا 2 خشتەلاکێشە 3 (توێکاری، هەروەها cuboid bone) ئێسکی شەشپالوویی ۞ *adj* مکعب‌مانند *n* 1 مکعب 2 مکعب‌مستطیل 3 کوبوید

**cuboidal** *adjective*

خشتەئاسا، شەشپالوویی ۞ مکعب‌مانند

**cub reporter** *noun*

هەواڵنێری تازەکار یان کەمئەزموون ۞ خبرنگار نوپا

**Cub Scout** = cub

**cuckold** /'kʌkəold, US -oold/ *noun*

(ناپەسند) ژنحیز، ژنکوونی، گەوواد، سەرگر، دەویت، دویت ۞ دیوث

**cuckoldry** *noun*

ژنحیزی، گەووادی، سەرگری، دەویتی، دویتی ۞ دیوثی

**cuckoo**[1] /'koku:/ *noun*

1 کوکو، پاکەریم، کۆترەنەخشینە، کۆترەپەپوو، پەپوو [*Cuculus canorus*] 2 بۆ ناوی دەستە باڵندەیێکی تری وا لە هەمان خێزان (Cuculidae) بەکاردێتریَ ۞ فاختە

**cuckoo**[2] /'koku:/ *adjective*

(بێباو و نافەرمی) 1 شێت، دەلوو، دێن 2 گەوجانە ۞ 1 دیوانە 2 احمقانە

**cuckoo bee** *noun*

هەنگەپەپوو، جۆرێکی مشەخۆر کە گەراکانی لەنێو هێلانەی جۆرێکی تری هەنگ دادەنێ (*Nomada*، *Psithyrus* و توخمەکانی تر) ۞ کوکوبی

**cuckoo clock** *noun*

سەعاتی پەپو، سەعات یان کاتژمێری کۆترەپەپوو، سەعاتی پەپوو (کوکو، سەعاتێ کە دەنگی لە کۆترەپەپوو دەچێ) ۞ ساعت کوکو

**cuckooflower** *noun*

(رووەکناسی) پێکەوک، گوڵەپەپوو؟ [*Cardamine pratensis*] ۞ کوکوفلاور

**cuckoo pint** *noun*

جۆرێ arumی کێوی ئاسایی [*Arum maculatum*] ۞ نوعی گیاه

**cuckoo spit** *noun*

کەفێکی مەیلەوسپی سەر گەڵا و قەد و لاسکی هێندێ رووەک، لە لایەن کرمۆمەکانی froghoppers دەردەدرێ ۞ کوک اسپیت

**cuckoo wasp** *noun*

هەنگەزاڵەپەپوو، کلکسوورە ruby-tail یا هەنگەزاڵەی تر کە گەراکانی لەسەر هێلانەی هەنگ یا هەنگەزاڵەیێکی تر دادەنێ ۞ نوعی زنبور

**cuculiform** *adjective*

پەپووئاسا ۞ فاختەمانند

**cucullate** *adjective*, also cucullated

کڵاودار، بە شێوەی کڵاوخوود ۞ کلاهک‌دار

**cucumber** /'kju:kʌmbə(r)/ *noun*

1 (میوە) خەیار، هاروێ، ئاروو 2 جۆری ڕووەکی پیاهەڵچوو لە خێزانی gourd کە ئەو میوەیە دەگرێ، لە بنەڕەتدا ڕەسەنی ناوچەی هیمالایای چینە [*Cucumis sativus*] ✿ 1 خیار 2 نوعی گیاه

**cucumber mosaic** *noun*
جۆری نەخۆشی ڕووەک ب.ت. هی خەیار کە بەهۆی ڤایرۆسێکی تاکڕیشاڵی RNA یەوە تووش دەبێ و زۆرتر بەهۆی مێشوولەیێکەوە ڕادەگوێزرێ و دەبێتەهۆی پنکەپنکەبوونی پەڵوپۆ [جۆر *Cucumber mosaic virus* هی تۆخمی *Cucumovirus*، خێزانی Bromoviridae] ✿ نوعی بیماری گیاهی به ویژه خیار

**cucumiform** *adjective*
خەیارئاسا، شێوەخەیار ✿ خیارمانند

**cucurbit** /kjʊˈkɜːbɪt/ *noun*
گیایێ لە تیرەی gourd (Cucurbitaceae) کە کالەک، کوولەکەئاوی pumpkin، کوولەکە squash و خەیار دەگرێتەوە ✿ نوعی گیاه

**cud** /kʌd/ *noun*
کاوێژ ✿ نشخوار

**cuddle** /ˈkʌdl/ *noun*
باوەش، ئامێز، حەمێز ✿ بغل، آغوش

**cuddly** /ˈkʌdli/ *adjective* (cuddlier, cuddliest), also cuddlesome
ژیکەڵە، ژیرکەڵە، خۆشەویست، جوان، شیاوی باوەشکردن ✿ بغل‌کردنی

**cuddy** *noun*
1 کەر، گوێدرێژ 2 کەسێکی کەرو نەفام ✿ 1 خر 2 آدم احمق

**cudgel** /ˈkʌdʒl/ *noun*
تێلا، داردەست، مەشاک، کوتەک ✿ چماق

**cudgel play** *noun*
شەڕەتێلا، شەڕەکوتەک ✿ جنگ با چماق

**cudweed** *noun*
گیایێ لە تیرەی daisy، بە گەڵای کوڵکنەوە، بە گوڵی نادیارەوە inconspicuous [تۆخمەکانی *Gnaphalium* و *Filago*] ✿ نوعی گیاه

**cue**[1] /kjuː/ *noun*
1 سەرەدەزوو، سەرەداو، سەرەپەت 2 ڕێز 3 ئاماژە، مێزە 4 شێوە، ڕەوت 5 نیشانە، بەرژەنگ، درف 6 سەرمەشق، دادراوە 7 کاتی چاوەڕوانکراو، وەخت یان دەرفەتی گونجاو ✿ 1 سرنخ 2 ردیف 3 روش 4 اشاره 5 علامت 6 سرمشق 7 لحظه‌ی موعود، وقت مناسب

**cue**[2] /kjuː/ *noun*
داربیلیارد ✿ چوب بیلیارد

**cue ball** *noun*
تۆپ یان گۆی بیلیارد ✿ گوی بیلیارد

**cueca** /ˈkwɛkə/ *noun*
جۆرێ هەڵپەڕکێی کرژی ئەمریکای باشووری (بنەڕەت: سپانیایی ئەمریکایی) ✿ کویکا

**cuesta** /ˈkwɛstə/ *noun*
(زەویناسی) لێژە: زنجیرەیێکی چینچینی لایێ، لایێکی کەمێ لێژ و لایەکەی تر زۆر لێژ ✿ کوبستا

**cuff**[1] /kʌf/ *noun*
1 سەرقۆڵ، مەچەکە، هووچک، سەردەس: *a collar and cuffs of white lace* 2 دەلینگی هەڵکراو یان دووقەد ✿ 1 مچ (پیراهن)، سرآستین (کت) 2 دوبل

**cuff**[2] /kʌf/ *noun*
مشت، شەپلاخە، چەپۆک (سووک): *to give somebody a friendly cuff* ✿ مشت، سیلی

**cuff-links** *noun, pl.*, also cuffs
دوگمەی سەردەس ✿ دکمه‌ی سردست

**Cufic** = Kufic

**cuirass** /kwɪˈras/ *noun*
1 زرێی بێقۆڵ، زرێی سنگ‌وپشت، چوارئاوێنە 2 ژێرکراسی بێقۆڵی ژنان ✿ 1 جوشن بدون آستین 2 زیرپیراهن بی‌آستین زنان

**cuirassier** /ˌkwɪrəˈsiːə, French kɥiʀasje/ *noun*
سواری زرێپۆش ✿ برگستوان‌پوش

**cuisine** /kwɪˈziːn/ *noun*
(فەرەنسی) شێوەی چێشتلێنان، شێوازی ئاشپەزی، دەستاو، دەس‌وپوخت (بنەڕەت: لە فەرەنسییەوە بە واتای "چێشتخانە kitchen") ✿ سبک آشپزی، پخت و پز

**cuisse** /kwɪs/ *noun*, also cuish /kwɪʃ/
زرێی ڕان، ڕانەوانە ✿ زره ران

**culch** = cultch

**culchie** /ˈkʌl(t)ʃi/ *noun, pl.* culchies
(ئیرلەند و سووکانە) ساویلکە، دێهاتی، لادێیی ✿ دهاتی، ساده‌لوح

**Culdee** /kʌlˈdiː/ *noun*
خودایار، ڕەبەنی کلیسەی Celtic ✿ کولدی

**cul-de-sac** /ˈkʌl də sæk/ *noun, pl.* culs-de-sac pronunc. same
بێسەرەدەر، بنبەست، ڕێکوورک، کوێرەکۆڵان، کوچکە، کوێرەشەقام، شەقامی بێسەرەدەر ✿ بن‌بست

**-cule** *suffix*
پاشگر: ـیلە، ـۆچکە، ـچە، ـژە، ـەڵە: *reticule molecule* (بنەڕەت: لە فەرەنسی یان لاتینەوە *-culus, -cula, -culum*) ✿ پسوند: اسم‌ساز، ـچه

**culex** /ˈkjuːlɛks/ *noun, pl.* culices /-lɪsiːz/
نێرەمێشوولە، مالاریا ڕاناگوێزن ✿ خانواده‌ی پشه

**culicid** /kjuːˈlɪsɪd/ *adjective, noun*
مێشوولەیی، مێشوولەئاسا، مێشوولە ✿ پشه‌ای، پشه

**culicine** /ˈkjuːlɪsʌɪn, US -siːn/ *noun, adjective*

میشووله ◇ پشه

**culicoid** /'kju:lɪsɔɪd/ *adjective*
میشوولەیی، میشوولەئاسا، شێوەمیشووله ◇ پشەمانند

**culinary** /'kʌlɪnəri, US -neri/ *adjective*
سەربە چێشتلێنان، سەربە ئاشپەزی، دەستاو، دەس‌وپوخت ◇ وابسته به آشپزی، دست و پخت

**cull** /kʌl/ *noun*
کوشتن، کوشتنەوە، سەربڕین: *the annual seal cull* ◇ عمل کشتن، کشتار

**cullender** = colander

**culler** *noun*
کۆکەرەوە ◇ جمع‌کننده

**cullet** /'kʌlɪt/ *noun*
وردەشووشەیێ کە لە شووشەسازیدا بەکاردێنرێتەوە ◇ کولت

**cullion** /'kʌljən/ *noun*
1 مرۆی خوێڕی 2 گون، باتوو 3 گیاسارمە (بنەڕەت: لە *coillon* ئینگلیسی نێوەڕاست "testicle"، لە *-coleon*، *coleo* لاتینی ڕەمەکی Vulgar Latin، لە *coleus* لاتین "*scrotum*") ◇ 1 آدم پست 2 بیضه 3 گیاه ثعلب

**cullis** /'kʌlɪs/ *noun*
1 بلووسک، ئاوەڕۆ 2 شۆرباو گۆشت ◇ 1 ناودان 2 آب‌گوشت

**cully** /'kʌli/ *noun, pl.* cullies
1 (نافەرمی و کۆن) کەسێکی سادە یان زووهەڵفریواو 2 کاکە، برادەر، کاکی خۆم (بۆ لێ‌پرسینی شتێ) ◇ 1 آدم ساده 2 دوست من

**Culm** /kʌlm/ *noun*
1 (زەویناسی) زنجیرە چینی سەردەمی خەڵووزینی باشووری ڕۆژاوای ئینگلتەرە 2 (culm) (کۆن) تۆز یان خۆڵوخاکی خەڵووز ◇ 1 کولم 2 غبار یا خاکەی زغال‌سنگ

**culm** /kʌlm/ *noun*
لاسک، ساقەت، کلۆش، کولۆش، قاسک، لاسکی نێوهۆڵۆڵ (ب.ت. ئەوەی کە گوڵ دێنێ) ◇ ساقەی میان‌تهی

**culminant** /kʌlmənənt/ *adjective*
لووتکەنشین، لووتکەگیر، سەرگیر، هەڵکەوتوو لە لووتکە، تەواوپێگەیشتوو ◇ واقع در اوج

**culmination** /ˌkʌlmɪ'neɪʃn/ *noun*
1 لووتکە، ئەوپەڕ، ترۆپک، گەیشتنەسەر، ئەنجام، بەرئەنجام 2 ئەنجامی کۆتایی، دوایین‌ئەنجام، دوائاکام 3 تەواوی، پێگەیشتن ◇ 1 اوج، حاصل 2 نتیجه‌ی پایانی 3 کمال

**culottes** /kju:'lɒts, US ku:'lɑ:ts/ *noun, pl.*
داوێن یان تەنوورەی شەڵواری، داوێنی شەڵواری ◇ کولات

**culpability** /ˌkʌlpə'bɪləti/ *noun,* also culpableness
1 کەمتەرخەمی، خەتاباری، گوناهباریتی، کۆتایی کردن، درێغی کردن 2 لەسەرکۆنەهاتوویی ◇ 1 قصور 2 سرزنش‌پذیری

**culpable** /'kʌlpəbl/ *adjective*
1 خەتابار، تاوانکار، گوناهکار، تاوانبار، گوناهبار 2 شایانی سەرکۆنە و بەسەرداهاتن ◇ 1 مقصر، مجرم 2 سرزنش‌پذیر

**culpably** /'kʌlpəbli/ *adjective*
لەڕووی خەتابارییەوە، خەتابارانە ◇ تقصیرکارانه

**culprit** /'kʌlprɪt/ *noun*
1 خەتابار، گوناهبار، گوناهکار، تاوانبار، بناسکار، گومانلێکراو، تاوانکار 2 سەرچاوە یا هۆی کێشەیەک، مایەی گرفت ◇ 1 مقصر، بزهکار، متهم، مجرم 2 منشا یا موجب مشکل

**cult** /kʌlt/ *noun*
1 دەستایین، تیرەی ئایینی یان دینی، پەرستە، کۆمەڵێکی ئایینی توندڕەو (کە بەشێ لە ئایینی دامەزراو نییە) 2 پەرستن، سیستم یان ڕێکخستەی باوەڕ و کردەوە ئایینییەکان 3 داب، شەپۆل، باو (گەلی): *4 the cult of physical fitness* لایەنگران، خولەسەربەکوشت‌دەران (بنەڕەت: لە *culte* فەرەنسی یان *cultus* لاتین "پەرستن") ◇ 1 فرقه، کیش 2 نظام عبادت 3 مد 4 طرفداران

**cultch** /kʌltʃ/ *noun,* also culch
1 پاشەڕۆک، خشت‌وخاڵ؛ *2 trash ،clutter* گەرای oyster ◇ 1 آشغال، ضایعات 2 کالچ

**cultigen** /'kʌltɪdʒ(ə)n/ *noun*
(ڕووەکناسی) گیای دەس‌نێژ یان دەس‌کردی مرۆڤ، گیای مرۆکرد؛ ڤاریتە یان جۆرێکی چێنراو لەو ڕووەکانەی کە ڕەچەڵەکێکی کێوی و خۆڕسکی ناسراویان نییە ◇ کولتیژن

**cultism** *noun*
دەستایین‌گەری، تیرەباوەڕی، دەستایین‌باوەڕی ◇ فرقه‌گرایی

**cultist** *noun*
دەستایین‌گەر، تیرەباوەڕ، دەستایین‌باوەڕ ◇ فرقه‌گرا

**cultivability** /ˌkʌltɪvə'bɪləti/ *noun*
لەکێڵان‌هاتوویی ◇ مزروعی، قابلیت کشت

**cultivable** /'kʌltɪvəbl/ *adjective*
لەکێڵان‌هاتوو، دەکێڵرێ: *cultivable land* ◇ مزروعی، قابل کشت

**cultivar** /'kʌltɪvɑ:/ *noun*
جۆرێکی گیا یان ڕووەک کە بە ڕێگای کێڵان یان چاندنەوە بەرهەم هاتووە (بنەڕەت: تێکەڵەی variety + cultivate) ◇ کولتیوار

**cultivated** /'kʌltɪveɪtɪd/ *adjective*
1 کێڵراو، چێنراو، تووێوەکراو، ڕوێنراو، شێوبڕاو، کێڵگە: *2 cultivated fields* ڕووناکبیر، ڕۆشنبیر، بەکەماڵ، ڕەوشت‌بەرز، بەروەردەکراو، ڕاهێنراو: *a cultivated young*

*woman* ۞ 1 زیرکشت 2 فرهیخته، تعلیم‌دیده

**cultivation** /ˌkʌltɪˈveɪʃn/ *noun*

1 کێلان، چاندن، چاند، وەرزین، وەرزاندن، داچەندن، رواندن، رووواندن، ناشتن، کشت، جووت‌کردن، گایاری: *rice/wheat, etc.* 2 *cultivation* پەروەردە، رووناکبیری، رۆشنبیری 3 دۆستایەتی ۞ 1 کشت، زراعت، شخم 2 پرورش، فرهیختگی 3 رفاقت

**cultivator** /ˈkʌltɪveɪtə(r)/ *noun*

1 جووت‌بەندە، وەرزێر، وەرزیار، کشتکار، جووتیار 2 پەنجەقازی، چنگاڵ. (دەزگاینکی تریش بۆ هەڵدانی کەردوو: کەردووکێش (دەستی)، کەردوو، دەوری: فارسی = مرزکش) ۞ 1 زارع، کشاورز 2 پنجەغازی

**cultural** /ˈkʌltʃərəl/ *adjective*

1 چاندی، فەرهەنگی، کولتووری: *economic, social and cultural factors* 2 سەربە موسیقا، ویژە و هونەر، ویژەیی: *◊ a cultural event* ۞ 1 فرهنگی *Europe's cultural heritage* 2 وابسته به موسیقا، ادبیات و هنر

**cultural anthropology** = social anthropology

**cultural attaché** *noun*

بەرپرسەی چاندی یان فەرهەنگی ۞ وابستەی فرهنگی

**cultural background** *noun*

پاشخانی چاندی یا فەرهەنگی ۞ زمینەی فرهنگی

**cultural cycle** *noun*

سووڕی چاندی، خولی فەرهەنگی ۞ چرخەی فرهنگی

**cultural desert** *noun*

چۆلگە یان بیابانی چاندی (فەرهەنگی، مەبەست ئەو جێگایەیە کە هیچ چالاکی‌یەکی فەرهەنگی یان چاندی لێ‌نەبێ) ۞ برهوت فرهنگی

**cultural development** *noun*

پەرەسەندنی چاندی، پێشکەوتنی فەرهەنگی ۞ پیشرفت فرهنگی

**cultural diffusion** *noun*

بڵاوبوونەوەی چاندی، تەنینەوەی فەرهەنگی ۞ اشاعەی فرهنگی

**cultural function** *noun*

ئەرک یا فانکشنی چاندی، کارکردی فەرهەنگی ۞ کارکرد فرهنگی

**cultural heritage** *noun*

کەلەپووری چاندی یان فەرهەنگی ۞ میراث فرهنگی

**cultural hetrogeneity** *noun*

ناچونیەکی چاندی، نایەکڕەنگی فەرهەنگی ۞ ناهمگنی فرهنگی

**cultural homogeneity** *noun*

چونیەکی چاندی، وەکیەکی فەرهەنگی ۞ همگنی فرهنگی

**cultural isolation** *noun*

گۆشەگیری چاندی، تەریک‌مانەوەی چاندی، دوورەپەرێزی فەرهەنگی ۞ جداماندگی فرهنگی

**cultural lag** *noun*

دواکەوتنی چاندی، پاش‌کەوتنی فەرهەنگی ۞ پس‌ماندگی فرهنگی

**culturally** /-rəli/ *adverb*

لەباری چاندی‌یەوە، لەبواری فەرهەنگی‌یەوە، لەباری فەرهەنگی‌یەوە ۞ از نظر فرهنگی

**cultural pattern** *noun*

نموونەی چاندی، پاتێرنی فەرهەنگی ۞ انگارەی فرهنگی

**culture** /ˈkʌltʃə(r)/ *noun*

1 چاند، فەرهەنگ، کولتوور، رۆشنبیری، رووناکبیری، هونەر و ئەدەبیات پێکەوە 2 راهێنان، بارهێنان، پەروەردە(کردن)، بەخێوکردن، پەروەراندن 3 داچەندن، کێلان، چاندن، کردن، رواندن، چەقاندن 4 گرووپێ لەو بەکتریا یان توولیزانەی کە وا بەمەبەستی لێکۆلینەوەی زانستی یان پزشکی دادچێنرێ، داچەندنی خانە(ی شانەیی) یان بەکتریا، چاندی توولیژە یان خانە ۞ 1 فرهنگ 2 پرورش 3 کشت، زراعت 4 کولتور، کشت میلیزە یا یاختە

**cultured** /ˈkʌltʃəd, US -tʃərd/ *adjective*

1 رۆشنبیر، رووناکبیر 2 پەروەردەکراو، بەخێوکراو، راهێنراو 3 داچێنراو، کێلراو، چەقێنراو، چێنراو، چێندراو: *cultured cells* ۞ 1 بافرهنگ، فرهیخته 2 پرورشی، پرروش‌یافته 3 کشت‌شده

**cultured pearl** *noun*

مرواری پەروەردەکراو یان داچێنراو ۞ مروارید پرورشی

**cultureman** *noun, pl.* culturemen

مرۆڤی رۆشنبیر ۞ انسان فرهیخته

**culturemania** *noun*

شێتی چاندی یان فەرهەنگی ۞ شیدایی فرهنگی

**culture shock** *noun*

سەرلێ‌شێوان یا گورزی فەرهەنگی یا چاندی ۞ ضربەی فرهنگی

**culture vulture** *noun*

خۆرەی چاند یان فەرهەنگ (بۆ شۆخی) ۞ خورەی فرهنگ

**cultus** /ˈkʌltəs/ *noun*

سیستم یان جۆرێکی پەرستنی دینی ۞ نظام یا گونەای از پرستش مذهبی

**culverin** /ˈkʌlv(ə)rɪn/ *noun*

1 جۆرێ تۆپی سەدەی شازدە یان حەڤدە، بە لوولەی درێژەوە 2 جۆرێ دەمانچەی سەدەکانی پازدە و شازدە ۞ کولورین

**culvert** /ˈkʌlvət, US -vɔrt/ *noun*

1 ناوەڕۆ، ناوڕێژ، رەهەنداو (لەژێر رێگا یان رێی

ئاسن)، جۆگەی سەرگیراو 2 ڕەهەندی ژێرعەرزی، بۆری ژێرزەوی (بۆ تۆری کابلی ئێلیکتریکی) ◌ 1 آبگذر، نهر سرپوشیده 2 کانال زیرزمینی

**cum** /kʌm/ *preposition*
یش، ژی، و، هەم... و هەم...: *a bedroom-cum-study* (لە لاتینەوە) ◌ هم... و هم...، و

**cum** /kʌm/ informal variant spelling of come

**cumber** /'kʌmbə/ *noun*
گیرەوە، کۆسپ، تەگەرە ◌ مانع

**Cumberland sauce** *noun*
جۆرێ سۆسی تیژ piquant لە ژێلەی تری سووره ساز دەکرێ، لەگەڵ گۆشتی ساردا دادەنرێ ◌ نوعی سس

**Cumberland sausage** *noun*
(لە بریتانیا) جۆرێ سۆسیسی درشت ◌ نوعی سوسیس

**cumbersome** /'kʌmbəsəm, US -bərs-/ *adjective*, also combrous /'kʌmbrəs/
1 قورس، پرنەرک، مایەی زەحمەت، هەراسانکەر، دەس‌وپێگر، گەورە و قورس، زلە، ناقۆلا، نالەبار، ناهەموار، بارناخۆش، تەکاننەدراو، ئاڵۆز، کەم‌جم‌وجۆڵ، چەقیو، گرانهەڵگیراو، troublesome، burdensome، 2 *cumbersome machinery* :bulky هێواش، خاو، ponderous 3 ئاڵۆز، پێچەڵاوپێچ: *cumbersome legal procedures* - cumbersomely *adv*، cumbersomeness *n*) ◌ 1 بزرگ و سنگین، پیچیده 2 کند، کم‌تحرک، آهسته 3 پیچیده

**cumbia** /'kʊmbɪə/ *noun*
جۆرێ موسیقای هەڵپەرکێی بە ڕەچەڵەک کۆلۆمبیایی، شێوەی salsa دەدا (بنەڕەت: لە سپانیایی کۆلۆمبیاییەوە) ◌ کومبیا

**cumbia** = 1 trouble bother 2 burden; encumbrance

**cumbrous** = cumbersome (cumbrously adv; cumbrousness)

**cum grano salis** /kʌm ˌgrɑːnəʊ 'sɑːlɪs/ *adverb*
(لاتین) لەگەڵ کەمێ یان برێ خوێ ◌ همراه به کمی نمک

**cumin** /'kʌmɪn/ *noun*, also cummin
1 زیره، ژیره، کومین (سەوز یان سپی) 2 ڕووەکی زیره [*Cuminum cyminum*] (بنەڕەت: ئینگلیسی نێوەڕاست، لە *cymen* ئینگلیسی کۆن، لە *cuminum* لاتین، لە *kyminon* یۆنانی، بنەڕەت سامی، پێوەندی بە *kamūnu* ئەکەدییەوە هەیە "زیره cumin") ◌ 1 زیره 2 گیاه زیره

**cuminseed** *noun*
زیره، کومین ◌ زیره

**cum laude** /ˌkʊm 'lɔːdi, ˌkʊm 'laʊdeɪ/ *adverb, adjective*
(لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا) بە شانازییەوە، بە پێزانینەوە، لەگەڵ پەسن: *He graduated cum laude* (بڕوانە magna cum laude و summa cum laude؛ بنەڕەت: لە لاتینەوە بە واتای "لەگەڵ پەسن praise") ◌ (همراه) با افتخار، با قدردانی

**cummerbund** /'kʌməbʌnd, US -mərb-/ *noun*
پشتێن، پشتوێن، کەمەرپێچ، کەمەربێن (بنەڕەت: لە "کەمەربەند"ەوە وەرگیراوە) ◌ شال کمر

**cumquat** = kumquat

**cumshaw** *noun*
هەرەوەها tip، gratuity، present، bribe، payoff ◌ انعام و...

**cumul(i-, o-)** *prefix or combining form*
پێشگر یان شێوەی لێکدەر: کۆمۆلۆس و: *cumulonimbus* ◌ پیشوند یا صورت ترکیب‌ساز

**cumulate** /'kjuːmjʊlət/ *adjective*
کەڵەکە، کۆوەبوو، خڕەوەبوو، کۆمەڵکە ◌ انباشته

**cumulation** /ˌkjuːmjuː'leɪʃn/ *noun*
1 کۆکردنەوە، خڕکردنەوە، گردکردنەوە، کەڵەکەکردن، کۆمەڵکەکردن 2 کەڵەکەکراوی، سەرییەکنراوی، بەسەرییەکداکەوتوویی 3 کەڵەکە، کۆمەڵکە، تۆپەڵک ◌ 1 گردآوری 2 انباشتگی 3 توده

**cumulative** /'kjuːmjələtɪv, US -leɪtɪv/ *adjective*
1 پەرەسێن، ڕوولەزۆری، ڕوولەگەشە، ڕوولەپەرە، زیادەوەبوو، سەرەوەبوو: *the cumulative effect of human activity on the world environment* ◊ *cumulative penalty* 2 کۆوەبوو، خڕەوەبوو، سەرییەککەوتوو، بەسەرییەکداکەوتوو، کەڵەکەکراو، کەڵەکەبوو ◌ 1 افزاینده، متزاید، رو به افزایش 2 تراکمی، متراکم

**cumulative effect** *noun*
کاریگەری ڕوولەپەرە ◌ تأثیر فزاینده

**cumulatively** /'kjuːmjələtɪvli, US -leɪtɪvli/ *adverb*
ڕوولەزۆر، بەشێوەیەکی ڕوولەپەرە ◌ به طور فزاینده

**cumulativeness** /'kjuːmjələtɪvnəs, US -leɪtɪvnəs/ *noun*
پەرەسێنی، ڕوولەزۆربوون، ڕوولەپەرەبوون ◌ فزایندگی

**cumulative evidence** *noun*
(ماف) بەڵگە و شایەدی ڕوولەپەرە ◌ شواهد فزاینده

**cumulative voting** *noun*

دەنگی بەکۆمەڵ ۞ رأی جمعی

**cumuliform** *adjective*

شێوەکۆمۆلۆس cumulus، خاوەنی ڕواڵەت یان تایبەتمەندی هەورەکانی کۆمۆلۆس: *cumuliform clouds* ۞ کومولیفورم

**cumulonimbus** /ˌkjuːmələʊˈnɪmbəs, US -loʊ-/ *noun, pl.* cumulonimbi /-bʌɪ/

کۆمۆلۆنیمبۆس (هەور، زۆرتر بە شێوەی دەزگا یان سندان و لە بەرزاییەکاندا هەیە) ۞ کومولونیمبوس

**cumulus** /ˈkjuːmjələs/ *noun, pl.* cumuli /-lʌɪ, -liː/

1 کۆمۆلۆس، توێەڵەهەور، کەڵەکەهەور 2 کەڵەکە، کۆمەڵکە، توێەڵە (لە لاتینەوە بە واتای "heap") ۞ 1 کومولوس 2 تودە، پشتە

**Cuna** = Kuna

**Cunaxa** *noun,* geographical name

کوناکسا، کوناکسا: شارێکی کۆن لە بابل Babylonia، نزیک بە فورات Euphrates: شوێنی تێشکانی کورشی بچوک Cyrus the Younger لە ئەردەشیری دووهەم Artaxerxes II لە 401 پێش‌زایینی‌دا ۞ کوناکسا

**cunctation** *noun*

خاوەخاو، کنگەکنگ، ساوەساو، قوونەقوونکردن، مەسەمس، وێستان، بەکنگاخستن، دواخستن ۞ تعلل، مکث، تعویق

**cuneate** /ˈkjuːnɪət/ *adjective*

(توێکاری و ڕووەکناسی) پوازەیی، سنگی، پوازئاسا، مێخی (بنەڕەت: cuneatus لاتین، لە cuneus "پواز") ۞ میخی

**cuneiform** /ˈkjuːnɪfɔːm, US -fɔːrm/ *noun, adjective*

*n* هێڵی پو(و)ازی، پوازەهێڵ، شێوەنووسینێکی کۆنی میزۆپۆتامیا، ئێران و یوگاریت Ugarit *adj* 1 پوازی، بزماری، مێخی، سنگی: 2 *cuneiform syllabary* (زیندەناسی و توێکاری) پوازەیی، پوازئاسا، پووازانە، شێوەپواز، سنگی (بنەڕەت: لە *cunéiforme* فەرەنسی یان *cuneiformis* لاتینی نوێ، لە *cuneus* لاتین "پواز، پوواز" wedge") ۞ *n* خط میخی *adj* میخی

**cunjevoi** /ˈkʌndʒɪvɔɪ/ *noun*

1 (ڕووەکناسی) جۆرێ گیای ئەوسترالیایی لە تیرەی arum [*Alocasia macrorrhiza*] 2 جۆرێ sea squirt ی ئەوسترالیایی، بۆ چەشتەی ڕاوەماسی بەکاردێتری [*Alocasia macrorrhiza*] ۞ کونجیووی

**cunner** /ˈkʌnə/ *noun*

جۆرێ ماسی wrasse ی بۆری سەوزباوی خۆراکی، هی کەنارەکانی ئەتلانتیکی ئەمریکای باکووری [*Tautogolabrus adspersus*] ۞ کونر

**cunnilingus** /ˌkʌnɪˈlɪŋgəs/ *noun,* also cunnilinctus

زێلستنەوە، قوزلستنەوە، زێلیسی ۞ فرج‌لیسی

**cunning** /ˈkʌnɪŋ/ *adjective, noun*

*adj* 1 فێڵەباز، زۆرزان، لەخشتەبەر، سەگ، کەلەکباز، مەکرباز، قومارباز، زرینگ، زیرەک، قوت، وریا، مدریک، فێڵەبازانە، زیرەکانە، مەکر، فێڵ، تەڵەکە، حوقە 2 نازدار *n* زیرەکی، زرینگی، زۆرزانی، فێڵەبازی، کەڵەکبازی 1 *adj* ۞ (cunningness *n* cunningly *adv*) حقه‌باز، مکار، زبل، ماهر، مکارانه، مکر، حیله 2 ملوس *n* زیرکی، مکاری، حیله‌گری

**cunt** /kʌnt/ *noun*

1 قوز، خەمشە، زێ 2 وشەیێکی ساردوسووکە لە کاتی توورەبوون‌دا دەوترێ، گوو، لەبنی گوو 3 مرۆی هیچ ۞ 1 کس، فرج 2 کانت 3 آدم رذل

**cup** /kʌp/ *noun*

1 پیالە، کوتک، کاس، بایە، تاسولکە، جام، قاپ 2 ئایەرە، لیوان 3 جام یان کاس (لە پێشبڕکێ، خەڵات و هتد) 4 خواردنەوە 5 پڕپیالەیێ 6 شاخ، کەڵەشاخ (بۆ خوێن‌گرتن) 7 بەش، پشک 8 (ڕووەکناسی) کاسە، کڵاوە، پیالە، جام ۞ 1 فنجان، جام، پیاله، کاسه 2 پیمانه 3 (مسابقات) جام 4 مشروب 5 به اندازه‌ی یک فنجان 6 شاخ 7 قسمت 8 (گیاه‌شناسی) جام، کاسه

**cup-bearer** *noun*

مەیگێڕ ۞ ساقی

**cupboard** /ˈkʌbəd, US -bərd/ *noun*

دۆڵاب، کومێد، قەفەسە، کابینێت ۞ قفسه، گنجه، کمد

**cupboard love** *noun*

خۆشیرین‌کردن، خۆشیرینی ۞ خودشیرینی

**cupcake** /ˈkʌpkeɪk/ = fairy cake

**cupel** /ˈkjuːp(ə)l/ *noun*

بۆتە، دریچە (بنەڕەت: لە *coupelle* فەرەنسی، چکۆلێنراوی *coupe* "goblet") ۞ بوته

**cupellation** *noun*

دریچەسان(دن)، بۆتەسان (پاڵاوتنی کانزا زۆربایی‌یەکان بە قاڵ‌کردنیان لەنێو دریچەدا) ۞ کاپلاسیون

**cup final** *noun,* also Cup Final

پێشبڕکێی کۆتایی، دوایین پێشبڕکێ، دوایین‌بڕکێ (ب.ت. توپێن) ۞ مسابقه‌ی نهایی

**cupful** /ˈkʌpfʊl/ *noun, pl.* cupfuls

(پڕ)پیالەیێ، پیالەبەرێ ۞ به اندازه‌ی یک فنجان

**cupid** /ˈkjuːpɪd/ *noun*

کیوپید (وێنە یان پەیکەری کوڕێکی جوان بە باڵ و تیر و کەوانێکەوە کە هێمای خۆشەویستی‌یە) ۞ کیوپید، کوپیدون

**Cupid** /ˈkjuːpɪd/ *noun,* Latin *Cupido*

کیوپید: خوای خۆشەویستی لای ڕۆمی‌یەکان،

هاوتای ئێروس Erosی یۆنانی ◌ کوپیدون
**cupidity** /kju:'pɪdəti/ *noun*
ماڵپەرستی، بەتەماحی، کنۆزی ◌ حرص، آزمندی
**cupola** /'kju:pələ/ *noun*
1 گومەز، قوببە، هەوق، تاق، میچی گومەزی 2 کوورەی پالاوتن یان پوختاندنی کانزا (هەروەها cupola furnace) 3 ئاسـتی رووچـال (cupolaed /-ləd/) ◌ 1 گنبد، سقف گنبدی 2 کوپُل 3 سطح مقعر
**cupola furnace** *noun*
کوورەی پالاوتن یان پوختاندنی کانزا، کوورەی قال ◌ کوپُل
**cuppa** /'kʌpə/ *noun*
(نافەرمی) پیالە چایی ◌ فنجان چای
**cupper** *noun*
زانـای رکەنـە، رکەنـەوان، کووپـەگر، خـوێنگر، کووزکێش ◌ عالم حجامت
**cupping** *noun*
کەلەشاخ، کووپە، کووزک ◌ بادکش
**cupreous** /'kju:prɪəs/ *adjective*
سەربە مس، مسی، مسین، مس‌ئاسا ◌ مسی، مس‌مانند
**cupriferous** /kju:'prɪfərəs/ *adjective*
مسەلان، مساوی، مس‌تیابوو ◌ مس‌خیز
**cupric** /'kju:prɪk/ *adjective*
سەربە مس، مسی، مسین ◌ وابسته به مس
**cuprite** /'kju:prʌɪt/ *noun*
بەردەمس (= لە ئۆکسایدی مسی یا مس‌دار پێکهاتووە) ◌ کوپریت
**cupr(o)-** /'kju:prəʊ/ *prefix*
پێشگر: مس، مسی (بنەڕەت: لە *cuprum* late Latin) ◌ پیشوند: مس، مسی
**cupro-nickel** *noun*
(کیمیا) مسونیکل (دارشتە) ◌ مس-نیکل
**cuprous** /'kju:prəs/ *adjective*
1 مسی، مسین 2 مساوی، مس‌دار، مس‌تیابوو، مسی تیایە ◌ 1 مسی 2 مس‌دار
**cup tie** *noun*
پێشبڕکێی بردنەوە (کـاپی یـان خـەڵات) ◌ مسابقەی جام حذفی
**cupulate** *adjective*
پیالەیی، کاسەیی، جامی، کڵاوەیی ◌ فنجانی، کاسەای
**cupule** /'kju:pju:l/ *noun*
(رووەک‌ناسی و گیانەوەرناسی) کڵاوە، کاسە، پیالە، جام ◌ کاسه جام
**cur** /kɜ:(r)/ *noun*
1 سەگی در (و بەرەڵا)، سەگەهار 2 (نافەرمی) مرۆڤی بێ‌بایەخ و سووک ◌ despicable man 1 سگ وحشی 2 آدم فرومایه
**curability** /ˌkjʊərə'bɪləti, US ˌkjʊr-/ *noun*
لـەچارەهاتوویی، لـەدەرمان‌هـاتوویی ◌ علاج‌پذیری، قابلیت درمان
**curable** /'kjʊərəbl, US 'kjʊr-/ *adjective*
لەچارەهاتوو، لەدەرمان‌هاتوو، دەرمان دەکرێ ◌ علاج‌پذیر، قابل درمان
**curaçao** /ˌkjʊərə'səʊ, US -'seɪəʊ, US ˌkju:rə'soʊ, -saʊ/ *noun, pl.* curaçaos
کیوریسو (= جۆرێ لیکۆر بە تام و چێژی پرتەقاڵ) ◌ کوراسو
**curacy** /'kjʊərəsi, US 'kjʊr-/ *noun, pl.* curacies
پلەوپایە یان سەروبەندی کیوریت، یاریدەدەریتی قەشەی ناوچە ◌ منصب یا دوران کورات، کوراسی
**curacy vicar** *noun*
یاریدەدەری Vicar ◌ دستیار Vicar
**curandero** /ˌkjʊərən'dɛ:rəʊ, Spanish kuran'ðero/ *noun, fem.* curandera /-'dɛ:rə, Spanish -'ðera/, *pl.* curanderos or curanderas
(لە سپانیا و ئەمریکای لاتین) دەرمانگەرێ کە چارەسەری و دەرمانی خۆماڵی بەکاردێنێ ◌ شفادهنده
**curare** /kjʊ'rɑ:ri/ *noun*
ژاری (لە گیایێکی ئەمریکای باشووری دەگیرێ) سەرەتیر (لە لایەن سوورپێستەکانەوە) ◌ کوراری
**curassow** /'kjʊərəsəʊ/ *noun*
باڵدارێکی پۆپنەی چۆرئاسا، لە تیرەی guan، هی دارستانە گەرمێنەکانی ئەمریکا [تـوخم *Crax*: چەندین جۆرن] ◌ کوراسو
**curate** /'kjʊərət, US 'kjʊrət/ *noun*
قەشە (سادە)، یاریدەدەری قەشەی ناوچە ◌ کشیش
**curative** /'kjʊərətɪv, US 'kjʊr-/ *adjective, noun*
*adj* چارەساز، چاک‌کەرەوە، دەرمانکەر: *-tive n treatment* چارەسەری، تیمار، دەرمان (*curatively adv*) ◌ *adj* درمانی *n* درمان
**curator** /kjʊə'reɪtə(r), US kjʊ'r-/ *noun*
1 سەرپەرشت، چاودێر، ئاگادێر 2 مۆزەوان ◌ 1 متصدی، قیم 2 موزه‌دار
**curb** /kɜ:b, US kɜ:rb/ *noun,* also kerb
1 بەرتەسکی، بەرتەنگی 2 هەوسار، لەغاو، دەسکەڕێشمە 3 زێڕچەناگە، زنجیری ژێرچەنە، قورووبەن(د) 4 کۆنترۆڵ، راگیرکاری 5 ماسینی (رەفیسکەی) لاقی ئەسپ، ئوفە؟ 6 قاناو، لێواری قاناو ◌ 1 محدودیت 2 افسار 3 کورب 4 مهار 5 ورم (زانوی عقب) پای اسب 6 جدول
**curb roof** = mansard roof
**curbstone** = kerbstone
**curculio** /kɜ:'kju:lɪəʊ/ *noun, pl.* curculios
ئەسپێ یان سوونگی ئافەتی میوەی دار و (palm هی) *Conotrachelus nenuphar*]

جۆرەکانی تر] ۞ کورکولیو

**curcuma** /'kə:kjʊmə/ *noun*
(رووەکناسی) زەردەچێوە [تۆخم *Curcuma*] (بنەڕەت: لاتینی نوێ، لە *kurkum* عەرەبی "زافەران" saffron، لە *kuṅkuma* سانسکریت) ۞ زردچوبه

**curd** /kɜ:d, US kɜ:rd/ *noun*
1 لۆرک، دەلەمە، شیری مەییو یا گیرساو، ماست 2 سەلکی خۆراکی گوڵکەلەم cauliflower یان رووەکێکی وا (curdy *adj*) ۞ 1 لور، دلَمه 2 کورد

**curd cheese** /kɜ:d, US kɜ:rd/ *noun*
(زۆرتر لە بریتانیا) پەنیری دەلەمە ۞ پنیر دلَمه

**cure** /kjʊə(r), US kjʊr/ *noun*
1 چارەسەری، چارەکردن، دەرمان(کردن)، تیمار، چار، چاکبوونەوە: *the search for a cure for cancer* ◊ *The cure took six weeks* 2 چارە، ڕێچارە: *a -e for poverty* 3 دەرمان، دەوا ۞ 1 درمان، معالجه، بهبود 2 علاج 3 دارو

**curé** /'kjʊəreɪ, French kyʀe/ *noun*
(فەرەنسی) ئەرکی دینی، کار(وبار)ی قەشایەتی، قەشە، ئەرک و پەیوری قەشە ۞ کشیش، وظایف کشیش

**cure-all** *noun*, also panacea
نۆژدارۆو، گری‌کەرەوە، چارەسەرکەری گیروگرفت، کارساز(ی کاران)، ژیاندەرمان ۞ حلال مشکلات

**curettage** /kjʊə'retɪdʒ, ˌkjʊərɪ'tɑ:ʒ, US ˌkjʊrə'tɑ:ʒ/ *noun*
کۆرتاژ، کاری تاشینی مناڵدان (لە زمانی فەرەنسیدا کۆرتاژ بە واتای خاوێنکردنەوەی مناڵدان دوای بەراویتن بەکاردێنری) ۞ کورتاژ

**curette** /kjʊə'ret/*noun*
تاشەنە، تاشە(ک)، ئامرازی تاشین (چکۆلە، لە نەشتەرگەریدا ب.ت. مناڵدان uterus) ۞ ابزار تراش

**curfew** /'kɜ:fju:, US 'kɜ:rf-/ *noun*
1 هاتوچۆنەهێشتن، نەهێشتنی هاموشۆ 2 قانوون یان زاگۆنی هاتوچۆبڕینەوە: *The army imposed a dusk-to-dawn curfew* 3 ماوە یان سەروبەندی نەهێشتنی هاتوچۆ 4 سەرەتای نەهێشتنی هاتوچۆ ۞ 1 منع رفت‌وآمد 2 قانون منع رفت‌وآمد 3 ساعات منع عبور و مرور 4 آغاز منع عبور و مرور

**Curia** /'kjʊərɪə/ *noun*
دادگای پاپی ڤاتیکان Vatican (لە لایەن کلێسەی کاتۆلیکی رۆمییەوە Roman Catholic Church بەڕێوەدەبری) ۞ کوریا

**Curial** *adjective*
سەربە دادگای پاپی ڤاتیکان ۞ وابسته به کوریا

**curie** /'kjʊəri/ *noun, pl.* curies
کوری، کیوری: یەکەیێکی رادیۆئەکتیڤیتی، بەرامبەر بە $3.7 \times 10^{10}$ی شیبوونەوە لە هەر چرکەدا (بنەڕەت: لە ناوی فیزیکزانانی فەرەنسی Pierre و Marie *Curie*) ۞ کوری

**curio** /'kjʊəriəʊ, US 'kjʊrioʊ/ *noun, pl.* curios
(شتی) ئەنتیکە، دەگمەن، کەمپەیدا، کەمدەسکەوتە، دانسقە ۞ عتیقه، نادره

**curiosity** /ˌkjʊəri'ɒsəti, US ˌkjʊri'ɑ:s-/ *noun, pl.* curiosities
1 وردی، وردەوەبوون، زانینخوازی، بەپرسیاری، خۆتێهەڵقوتاندن، مەراقزانست: *Children show curiosity about everything* 2 تاسە، مەراق، بەپەرۆشی 3 نەناسی، سەیربوون، تازە، شتی کەمپەیدا یا کەمدەسکەوتە، ئەنتیکە، ناوازەیی (curiosity killed the cat: بەپرسیاری و خۆتێهەڵقوتاندن بەسە) ۞ 1 کنجکاوی، فضولی 2 اشتیاق 3 شگفتی، بدیع، نادره، عتیقه

**curiosa** /ˌkjʊərɪ'əʊsə/ *noun, pl.*
شتێکی سەیر، ب.ت. شتێکی هەرزانە ۞ کوریوسا

**curious** /'kjʊəriəs, US 'kjʊr-/ *adjective*
1 ورد(وەبوو)، زانینخواز، بەپرسیار 2 وریا، بەپەرۆش، بەتاسە، هۆگر 3 خۆلێهەڵقوتێن 4 سەیر، سەمەرە، نەناس، نائاسایی، ناوازە ۞ 1 کنجکاو 2 مشتاق 3 فضول 4 عجیب، غیرعادی

**curiously** /'kjʊəriəsli, US 'kjʊr-/ *adverb*
لە رووی بەپرسیارییەوە یان وریاییەوە، وریایانە ۞ از روی کنجکاوی

**curiousness** /'kjʊəriəsnəs, US 'kjʊr-/ *noun*
وردی، بەپرسیاری، وریایی، سەیری ۞ کنجکاوی، شگفتی

**curium** /'kjʊəriəm, US 'kjʊr-/ *noun*
کۆریۆم (بە ژ.گ. 96، ن. Cm، لە ناوی Marie و Pierre *Curie*) ۞ کوریم

**curl** /kɜ:l, US kɜ:rl/ *noun*
1 ئاڵقە، کەمە، چەمەرە 2 نەگریجە، قژی ئاڵقەئاڵقە، ئاڵقەی قژ، فر، لوول، قژی فر یان لوول 3 پێچ، باهەڵدران، لوولهەڵدران، پێچخواردن ۞ 1 حلقه 2 حلقه‌ی مو، فر، جعد، موی فرفری 3 پیچ، پیچ‌خوردگی

**curler** /'kɜ:lə(r), US 'kɜ:rl-/ *noun*
بابلیس، قژلوولکەر، فرەک، قژفرکەر ۞ بیگودی

**curlew** /'kɜ:lju:, US 'kɜ:rl-/ *noun, pl.* same or curlews
نەحمەدراوکەر [*Numenius arquata* و جۆرەکانی تر] ۞ گیلانشاه

**curlicule** /'kə:lɪkju:/ *noun*
قەفولوولی جوانی ۞ جعد تزئینی

**curling** /'kɜ:lɪŋ, US 'kɜ:rlɪŋ/ *noun*
بەردەخزێ، کورلینگ (یاری سەرسەهۆڵ، ب.ت. لە سکاتلەند یان کەنەدا) ۞ کورلینگ

**curling stone** *noun*
بەردی کورلینگ ◌ سنگ کورلینگ
**curling-tongs** *noun,* also curling iron, *pl.*
بابلیس، دەزگای لوول‌کردن یان فرکردنی قژ (بە گەرما)، فرەکی قژ ◌ فر دستی
**curly** /'kɜːli, US 'kɜːrli/ *adjective* (curlier, curliest)
فر، لوول، کرژ، کلیل: *I wish my hair was curly* ◌ فرفری، مجعد
**curmudgeon** /kɜː'mʌdʒən, US kɜːr'm-/ *noun*
کەسێکی رووتاڵ یا جینگزی، زووتووڕە یا هەڵتۆزین (curmudgeonness *n*: بەدخوویی، مرومۆچی) ◌ آدم ترش‌رو یا زودخشم
**curmudgeonly** /kɜː'mʌdʒənli, US kɜːr'm-/ *adjective*
رووتاڵ، بەدخولک، جینگزییانە ◌ ترش‌رو، عبوس، تندخویانە
**currach** /'kʌrə(x)/, also curragh = Irish and Scottish term for coracle
**currant** /'kʌrənt, US 'kɜːr-/ *noun*
(رووەکناسی) کشمیشی بێ‌دەنک، مێوژ ◌ کشمش بی‌دانه
**currawong** /'kʌrəwɒŋ/ *noun*
(باڵندەناسی) مەلێکی دەنگ‌خۆشی قەلەڕەشەئاسای ئەوسترالیایی [توخم *Strepera*: سێ جۆرن] ◌ کوراونگ
**currency** /'kʌrənsi, US 'kɜːr-/ *noun, adjective, pl.* currencies
*n* 1 پارەی وڵات: *trading in foreign currencies* 2 دەساودەس‌کردن، دەس‌کردن 3 برەوی، رەوندەیی، گەڕیان (پارە) 4 پەرەسەندن، بڵاوبوونەوە، تەنینەوە، تەشەنە، داگرتن: *The term 'post-industrial' now has wide currency* ◌ *n* 1 پول رایج 2 جریان، گردش (پول) 3 رواج 4 شیوع، پخش *adj* پارەیی *adj* پولی
**current** /'kʌrənt, US 'kɜːr-/ *adjective, noun*
*adj* 1 برەو، باو، داب: *words that are no longer current* 2 هەنووکە، (کاتی) ئێستا، رۆژانە، رۆژ، رۆژەڤ، ئێستاکانی: *current prices* 3 *a budget for the current year* ◊ لەگەڕ(دابوون)، دەساودەس‌کردوو، رەوندە، دەس‌کردوو (پارە) *n* 1 رەوندی، رۆین، رەوەن، رەوندە، خور، رەوان 2 رۆین یان رۆیشتنی ئاو، لێشاو: *He swam to the shore against a strong current* 3 کۆڕان، تەوژم: *Birds use warm air currents to help their flight* 4 تەزوو (با، ئێلیکتریسیتە): *a 15 amp electrical current* 5 رەوت، رەوڕەوە: *Ministers are worried by this current of anti-government feeling* ◌ *adj* 1 رایج، متداول 2 جاری، فعلی 3 در گردش (پول) *n* 1 جریان 2 جریان آب 3 جریان هوا 4 جریان برق 5 روند
**current account** *noun*
هەژمار یا حسابی رەوەن (رەوندە) ◌ حساب جاری
**current affairs** *noun*
رووداوەکانی رۆژ، دەنگ‌وباسی رۆژانە ◌ وقایع روز
**current asset** *noun*
سامان یا دارایی رەوندە یا ناجێگیر ◌ دارایی جاری
**current concentration** *noun*
خەستی رەوندە(یی) ◌ غلظت جریان
**current expense** *noun*
تێچووە رەوندەکان، خەرج‌وباری رەوندە ◌ هزینه‌های جاری
**currently** /'kʌrəntli, US 'kɜːr-/ *adverb*
ئێستاکانی، هەرئێستا، جاری، نووکە، جاریکانی: *Currently, over 500 students are enrolled on the course* ◊ *All the options are currently available* ◊ *This matter is currently being discussed* ◌ اینک، فعلاً
**curricle** /'kʌrɪk(ə)l/ *noun*
(مێژوویی) عەرەبانەیێکی سووک و ئاواڵە و دووپێچکە، دوو ئەسپ لەم‌لاو لەولاوە دەیکێشن ◌ نوعی درشکه
**curricular** /kə'rɪkjələ(r)/ *adjective*
وانەنامەیی، بەرنامەیی، سەربە بەرنامەی خوێندن، سەربە یان پێوەندی بە curriculum ـەوە هەیە ◌ وابسته به برنامه‌ی آموزشی
**curriculum** /kə'rɪkjələm/ *noun, pl.* curricula or curriculums
وانەنامە، بەرنامە، بەرنامەی خوێندن (خوێندنگا، کۆلێژ و هتد) ◌ برنامه‌ی آموزشی
**curriculum vitae** /kəˌrɪkjələm 'viːtaɪ/ *noun, pl.* curricula vitae
کورتەمێژوویێکی کاری، پێشینە یا سەربردەی کاری ◌ شرح سوابق
**curried** /'kʌrid, US 'kɜːr-/ *adjective*
لەگەڵ کاری (خۆراک، لەگەڵ بەهاراتێکی زۆر توند) ◌ همراه با کاری
**currier** /'kʌrɪə/ *noun*
1 پێستەخۆش‌کەر، تاڵچی 2 رنەک‌کێش، تیمارکەر، شاڵ‌وقاشاوکێش ◌ 1 چرم‌ساز 2 کوریر
**currier** /'kʌrɪə/ *noun*
پێستەخۆش‌کەری، تاڵدان، پێستەخۆش‌کردن ◌ چرم‌سازی
**currish** /'kɜːrɪʃ/ *adjective*
1 خوێڕی، هیچ‌وپووچ، چەپەڵ، نزم 2 رووتاڵ، بەدخوو، بەدخولک، مرومۆچ (currishly /'kɜːrɪʃli/ *adv*: 1 خوێڕییانە، چەپەڵانە 2

**currishness** (/'kə:rɪʃnəs/ *n*) ڕووتالانـــه، بەدخولـــکانه؛ ◯ 1 پست، رذل 2 بدعنق

**curry** /'kʌri, US 'kɜ:ri/ *noun, pl.* curries
کاری، دەرمانک، بەهارات، هەزویلە ◯ کاری

**curry-comb** *noun*
ڕنەک، سەپکە، قاشاو، قەشەو ◯ قشو

**curry powder** *noun*
هاڕاوەی کاری، تۆز یان هاڕاوەی هەزویلە ◯ پودر کاری

**curse** /kɜ:s, US kɜ:rs/ *noun*
1 دۆعالێ‌کردن، نەفرەت، خوداگیری، لەعنەت 2 جنێو، سخێف، دژوێن، دەمچەفتی 3 بەلا، ناسێو، تەڵەزگە 4 بێ‌نوێژی ◯ 1 نفرین، لعنت 2 فحش، ناسزا 3 مصیبت 4 قاعدگی

**cursed** /kɜ:st, US kɜ:rst/ *adjective*, also curst
1 دۆعالێ‌کراو، مەلعوون، خوداگرتوو: *The whole family seemed cursed* 2 بێزاوی، بێزەون، قێزەون، ناخۆش (*cursedly adv*: بێزەونانـه، قێزەونانـه؛ *cursedness n*) ◯ 1 نفرین‌شده، ملعون 2 نفرت‌انگیز

**cursive** /'kɜ:sɪv, US 'kɜ:rs-/ *adjective, noun*
*adj* تێکچڕژاو، (خەر و) پێکەوەنووساو (پیتەکان، دەس‌وخەت)، شکستە *n* 1 خەتی پێکەوەنووساو یان تێکچڕژاو، خەتی شکستە 2 شێوە یان شێوازێکی پیتە چاپی‌یەکان کە شێوەی دەست‌وخەت دەدەن (*cursiveness n*) ◯ *adj* شکسته *n* 1 خط شکسته 2 کورسیو

**cursively** /-:sɪvli, US 'kɜ:rs-/ *adverb*
بە شێوەیەکی تێکچڕژاو یان پێکەوەنووساو ◯ بە طور شکسته

**cursor** /'kɜ:sə(r), US 'kɜ:rs-/ *noun*
جێ‌شاندەر، جێ‌بین (کامپیوتێر) ◯ مکان‌نما

**cursorial** /kə:'sɔ:rɪəl/ *adjective*
(گیانەوەرناسی) شیاو بۆ هەڵاتن، پەڵ‌دار، پەلەوەر ◯ در خور دویدن

**cursorily** /'kɜ:sərəli, US 'kɜ:rs-/ *adverb*
1 سەرسەرەکی‌یانە، بێ‌وردبوونەوە، بە فشە 2 بە پەلە، بە هەڵەداوان، بە پەلەپرووزکێ ◯ 1 بە طور سطحی 2 شتاب‌زده

**cursory** /'kɜ:səri, US 'kɜ:rs-/ *adjective*
سەرسەرەکی، سەرپۆرتی، سەرپێیی، بەپەلە، بەهەشتاو، بێ‌سەرنج‌پێدان: *a cursory glance*، *a cursory* ◊ *examination/inspection* ◯ سطحی، گذرا

**curst** = cursed

**curt** /kɜ:t, US kɜ:rt/ *adjective*
1 کورت 2 تونـد، تونـدوتیژ 3 بێ‌ڕەوشتانە، بێ‌شەرمانە (*curtly* /-li, US -rtli/ *adv*: بێ‌ڕەوشتانە، بە توندی‌یەوە؛ *curtness n*: توندی، توندوتیژی، بێ‌ڕەوشتی 2 کورتی) ◯ 1 موجز 2 خشن 3 گستاخانه، بی‌ادبانه

**curtailment** *noun*
1 کەم‌کردنەوە، لێ‌کردنەوە، قرتاندن، لێ‌لابردن 2 بەرتەسکی، بەرتەنگی، سنووورداری 3 کورت‌کردنەوە ◯ 1 کاهش 2 محدودیت 3 مختصرسازی

**curtain** /'kɜ:tn, US 'kɜ:rtn/ *noun*
1 پەردە: *We left just* ◊ *a pair of curtains* *before the final curtain* 2 لۆ، تویژاڵ، توێ، بەرگ، ڕووپۆش، پارێزە، دیوار: *a curtain of rain/smoke* 3 دوایی، کۆتایی، دووماهی (*curtainless adj*) ◯ 1 پرده 2 لایه، پوشش، حفاظ 3 پایان

**curtain call** *noun*
هاتنەپێش پەردە یان شانۆگا، هاتنەبەر پەردە (ئەو دەمەی بینەران یان بیسەران چەپڵەیەیان بۆ لێدەدەن) ◯ آمدن به جلو صحنه

**curtained** *adjective*
پەردەدادراو، پەردەپۆش، پەردەکێشراو ◯ پرده‌کشیده

**curtain-hook** *noun*
قولاپ یان سنگی پەردە ◯ قلاب پرده

**curtain lecture** *noun*
بۆڵەبۆڵ یان پیاهەڵشاخانی تایبەتی ژن بەسەر مێردەکەیا ◯ چوب پرده

**curtain pole** *noun*
پەردەگیر، پەردەکێش، داری پەردە ◯ چوب پرده

**curtain raiser** *noun*
1 پێشەشانۆ، کورتەشانۆ 2 پێشەکی، کورتە، دەسپێک ◯ 1 پیش‌پرده 2 پیش‌درآمد

**curtain ring** *noun*
ئالقەی پەردە ◯ حلقه‌ی پرده

**curtain rod** *noun*
پەردەگیر، داریپەردە، پەردەکێش ◯ چوب پرده

**curtains** *noun, pl.*
1 بارودۆخی شپرزە، ڕەوشی ناهومێدکەر 2 کۆتایی، دووماهی، ب.ت. مەرگ ◯ 1 وضع مأیوس‌کننده 2 آخر، پایان

**curtal** /'kə:t(ə)l/ *noun*
جۆرێ بەسوون bassoon یان دالسیەن dulcian ی دوایی‌یەکانی سەدەی شازدە و سەرەتاکانی سەدەی هەژدە ◯ کورتال

**curtana** /kə:'tɑ:nə, US -'teɪnə/ *noun*
شمشێرێکی کولی دەسەڵاتدارانی ئینگلتەرە، بۆ ڕێ‌وڕەسمی تاج‌لەسەرنان بەخۆیانا دەکرد ◯ کورتانا

**curtilage** /'kə:t(ɪ)lɪdʒ/ *noun*
حەوشە، حەسار، حەوشە و خاکی دیوارکراوی خانووێ ◯ حیاط، مضافات

**curtsy** /'kɜ:tsi, US 'kɜ:rtsi/ *noun*, also

curtsey, *pl.* curtsys or curtsies
کورنش، بۆداهاتنەوە، خۆدانەواندن (بە نیشانەی ڕێز، ژنان) ◯ تعظیم
**curvaceous** /kɜːˈveɪʃəs, US kɜːrˈv-/ *adjective*, also curvacious
ڕێکوپێک، نەونەمام، جەستەڕێک، جوانچاک، شۆخوشەنگ (ژن؛ بە گشتی خاوەنی شێوە و پیچمی کەمێ چەمیو: *a curvaceous coastline*) curvaceousness /kɜːˈveɪʃəsnəs, US kɜːrˈv-/ *n* ◯ خوش‌قواره
**curvature** /ˈkɜːvətʃə(r), US ˈkɜːrv-/ *noun*
1 چەماوی، چەمانەوە، چەم، نووچی، کەوانەیی، داهاتنەوە، کەوانی، لاری، خواری، کووری (بڕبڕەی پشت): *curvature of the spine* 2 ڕادە یان پلەی چەمانەوە، ئەندازەی چەمانەوە: *the curvature of the earth* ◯ 1 انحنا، کجی 2 درجەی انحنا
**curve** *noun, adjective*
*n* 1 (بیرکاری، هێڵ) چەماوە، هێڵی چەمیو 2 چەماوی، چەم، نووچی، داهاتنەوە، کەوانی، کەچی، چەوتی: *a pattern of straight lines and curves* 3 (ڕێگا) پێچ: *a curve in the road* 4 هێڵێکی بەردەوام بە بێ گۆشە 5 (curves) curvy) deception ،trick = 6 parenthesis = ◯ (*adj* (curvier, curviest 1 (خط) منحنی 2 انحناء، خمیدگی 3 پیچ 4 کورو
**curved** /kɜːvd, US kɜːrvd/ *adjective*
چەماو، چەمیو، کوور، کەوانی، چەمی، کەچ، کەج، پلووچ، گێر، داهاتوو، نووچیاو، چەوتاوە: *a curved path/roof/blade* ◯ منحنی، خمیده
**curvet** /kəːˈvet/ *noun*
(ئەسپسواری) باز، بازد ◯ پرش
**curvi-** *prefix*
پێشگر: چەمیو، چەم، چەماو، پلووچ ◯ پیشوند: خمیده
**curviform** /kɜːvɪfɔːm/ *adjective*
لار، خوار، چەوێل، کوور، چەم، چەماوە، پلووچ، شێوەکەوانە ◯ خمیده، منحنی
**curvilinear** /ˌkɜːvɪˈlɪnɪə(r), US ˌkɜːrv-/ *adjective*, also curvilineal
هێڵ‌چەماو، چەماوە، لاچەماو، خاوەنی هێڵ یان هێڵە چەماوەکان (*n* curvilinearity؛ curvilinearly *adv*) ◯ دارای خطوط منحنی
**curving** *adjective*
چەمیو، چەماو، چەم، پلووچ، پێچ‌وپلووچ ◯ منحنی
**curvometer** *noun*
چەماوی‌پێو، چەمیوی‌پێو، چەم‌پێو ◯ انحناسنج
**curvy** /ˈkɜːvi, US ˈkɜːrvi/ *adjective* (curvier, curviest)
1 چەمیو، پلووچ، کوور: *curvy lines* 2 قیافەجوان، بەژن‌جوان، ڕێک‌وپێک، جوانچاک، شۆخوشەنگ (ژن) ◯ 1 خمیده 2 خوش‌قیافه
**cuscus** /ˈkʌskʌs/ *noun*
جۆرێ گیانەوەری توورەکەداری کلک‌گیر (کەر)ی دارژی، ڕەسەنی نیوگینی و باکووری ئەوسترالیا [*Spilocuscus maculatus* (هی خاڵ‌خاڵ) و جۆرەکانی تر] ◯ کاسکاس
**cusec** /ˈkjuːsek/ *noun*
یەکەی ڕۆیین یان ڕژان، ب.ت. ئاو، بەرامبەر بە یەک پێ یان فووتی سێ‌جا لە چرکەدا one cubic foot per second ◯ کوسک
**Cush** *noun*, also Kush
1 کورەگەورەی حام Ham (Gen. 10:6.) 2 ناوچەیێ کە لە کتێبی پیرۆزدا باسی کراوە و جاروبار وادەزانرێ کە میسری سەرەوە بێ 3 پاتشایەتی‌یێکی کۆن لە باکووری ئەفریکا، لە ناوچەی Nubia ◯ کوش
**cushat** /ˈkʌʃət/ *noun*
(کۆن، سکاتلەند) کۆترەدارینە ◯ طوقی اروپایی
**cushaw** /kʊˈʃɔː, US ˈkuːʃɔː/ *noun*
کوولەکەمل‌خوار، مقەور، کوولەکەزستانە ◯ کدوی حلوایی
**cush-cush** /ˈkʊʃkʊʃ/ *noun*
جۆرێ yam ی گەرمێنایی ئەمریکا [*Dioscorea trifida*] ◯ کوشکوش
**Cushing's disease** *noun*
نەخۆشی کوشینگ: کۆنیشانەی کوشینگ کاتێ بووبێتە هۆی تومۆری ژێرمێشکەرژێن pituitary gland ◯ بیماری کوشینگ
**Cushing's syndrome** *noun*
کۆنیشانەی کوشینگ: تێکچوونی مێتابۆلیک کە بە هۆی زۆر بەرهەمهێنانی هۆرمۆنەکانی لە لایەن کۆرتیکۆستەروید corticosteroid ژووروگورچیلەوە تووش هاتێ و زۆرجار قەڵەوی و هەستانی پەستانی خوێنی لێ‌دەکەوێتەوە (بنەڕەت: لە ناوی نەشتەرگەری ئەمریکایی Harvey W. *Cushing*) ◯ نشانگان کوشینگ
**cushion** /ˈkʊʃn/ *noun*
1 سەرین، گوژنەو، باڵیشت، پشتی، مێندەر، دۆشەک، متێن، نالی، بالیف، باڵنج، سەرینگا، باڵین، ژێرسەر، نازباڵنج (هی چکۆلە، هەروەها small cushion) 2 لۆدە، کۆما (لە مەتریالی نەرم) 3 پاراستن، ئاگالێ‌بوون 4 (مێزی بیلیارد) لێواری نێوەوە ◯ 1 کوسن، بالشتک، تشک، پشتی 2 توده 3 حفاظت 4 لبه‌ی داخلی
**cushioned** *adjective*
ئاسوودە، خۆش، ڕاحەت ◯ راحت
**cushion star** *noun*
جۆرێ ئەستێرەی دەریایی چکۆلەی (لەش)پان، پەلەکانی کوڵ و کورتن [*Asterina gibbosa* و جۆرەکانی تر] ◯ نوعی ستاره‌ی دریایی
**Cushitic** /kʊˈʃɪtɪk/ *noun, adjective*

*n* کۆمەڵی زمانانی ئەفریکای ڕۆژهەڵات سەربە خێزانی ئەفریکایی‌ئاسیایی Afro-Asiatic کە زۆرتر لە ئەتیۆپی و سۆمالیا قسەی پێ دەکرێ *adj* کوشیتیک: سەربەو کۆمەڵە زمانە (بنەڕەت: لە *Cush*، ناوی بەشێکی Nubiaی کۆن + -itic) ◌ کوشیتیک

**cushy** /ˈkʊʃi/ *adjective* (cushier, cushiest)
(نافەرمی) خۆش، ئاسوودە، ڕەحەت، ئاسان، بێ‌ئەرک: *a cushy job* ◌ راحت، سادە

**cusk** /kʌsk/ (*pl.* same or cusks) = torsk

**cusk-eel** *noun*
جۆرێ ماسی چکۆلانەی eelئاسا، کلکی تیژە [خێزان Ophidiidae: زۆر جۆرن] ◌ نوعی ماهی

**cusp** /kʌsp/ *adjective*
1 سەر، نووک، تیغە، چوکلە، گۆشە، تیژایی 2 تیژایی ددان، نووکی ددان 3 سەر یان نووکی مانگیلە 4 (بیرکاری) خاڵی کۆتایی 5 (بیناسازی) چوکلە، تیژایی چەلەمەیی (نێوان تاقە چکۆلەکانی tracery گۆتیک) 6 (توێکاری) چوکلە یان تیژایی زمانەی دڵ ◌ 1 نوک، تارک، تیزە 2 نوک دندان 3 نوک هلال 4 نقطەی بازگشت 5 تیزەی جناغی 6 لت

**cuspid** *noun*
دانی پێشەوە، کەڵبە، پێشەددان، درۆک (بنەڕەت: لە *cuspid- ،cuspis* لاتین "point" یان "apex") ◌ دندان نیش

**cuspidal** /ˈkʌspɪdl/ *adjective*
نووکدار، نووک‌تیژ، گۆشەدار، چوکلەدار ◌ نوک‌دار

**cuspidate** *adjective*, also cuspidated
نووک‌دار، نووک‌تیژ، گۆشەدار، شاخ‌دار، چوکلەدار ◌ نوک‌دار

**cuspidor** /ˈkʌspɪdɔː/ = spittoon

**cuss** /kʌs/ *noun*
1 قسەی ساردوسووک، جنێو، سخێف 2 بنیادەم، مرۆ ◌ 1 فحش 2 آدم

**cussed** /ˈkʌsɪd/ *adjective*
1 (نافەرمی) لاسار، کەللەڕەق، ناحاڵی، cursed، 2 cantankerous ،obstinate مەلعوون، (*adv* cussedly: لاسارانە، بە لاساری، کەللەڕەقانە: cussedness /ˈkʌsɪdnəs/ *n*) ◌ 1 کلەشق 2 لعنتی

**custard** /ˈkʌstəd, US -tərd/ *noun*
کاستێرد (جۆرێ سۆس) ◌ کاسترد

**custard apple** *noun*
1 جۆرێ میوەی زلە و گۆشتنی گەرمێنان، گۆشتێکی زەردی شیرینی هەیە 2 دارێ کە ئەو بەرە یان میوەیە دەگرێ، ڕەسەنی ئەمریکای باشووری و ناوەندییە [توخم *Annona*: چەندین جۆرن] ◌ کسترد اپل

**custard marrow** *noun*
کوولەکەی کاستێرد: جۆرێ کوولەکەی هاوینی کە لێوارێکی پەرەپەرەی scalloped edge هەیە ◌ نوعی کدو

**custard pie** *noun*
پای کاستێرد (کە ئەکتەرەکان بۆ پێکەنین لە شانۆدا بۆ یەکتری دەخەن) ◌ پای کسترد

**custodial** /kʌˈstəʊdiəl, US -ˈstoʊ-/ *adjective*
1 سەربە زیندان یان گرتووخانە، بەندیخانەیی 2 سەربە سەرپەرشتی: *the custodial parent* ◌ 1 وابستە بە حبس یا زندان 2 وابستە بە حضانت

**custodial sentence** *noun*
بڕیاری گرتووخانە یان زیندان (ئەو ماوەی کە وا دەبێ کەسێ بە مەبەستی سزادران لە گرتووخانەدا بمێنێتەوە) ◌ حکم زندان

**custodian** /kʌˈstəʊdiən, US -ˈstoʊ-/ *noun*
1 بەرپرس، چاودێر، سەخبێر، سەرپەرشت 2 ئاگادێر، نۆبەدار، دالان‌دار 3 ئەمین‌دار ◌ 1 متصدی، متولی، قیم 2 نگهبان، سرایدار 3 امانت‌دار

**custody** /ˈkʌstədi/ *noun*
1 سەرپەرشتی، چاودێری، سەخبێری، ئاگادێری، ئاگاداری، ئاگالێبوون، بەرپرسایەتی، لێپرساوێتی 2 ئەمین‌داری 3 گلدانەوە، زیندانی‌کردن، گرتن، بەندکردن، دەس‌بەسەری 4 زیندان، گرتووخانە ◌ 1 حضانت، نگهداری، تصدی 2 امانت 3 توقیف، بازداشت 4 حبس

**custom** /ˈkʌstəm/ *noun, adjective*, also custom-built
*n* 1 داب، ڕەسم، ئاسا، نەریت، هۆرتە، یاسا، کەڤنەشۆپ، کەلەپوور، عورف، دەستوور، ڕێوشوێن (کۆمەڵایەتی): *an old/ancient custom* ◊ *It's a local custom* ◊ *custom of giving presents at Christmas* 2 پیشە، عادەت، خوو: *It was her custom to rise early* 3 کڕین، سەندن: *Thank you for your custom. Please call again* 4 کڕیار، مشتەری، کڕیاران *adj* 1 ڕاسپاردەیی، کەسانە: *a custom motorcycle* 2 کەسانەدروو، تایبەت‌دروو ◌ *n* 1 رسم، سنت، عرف 2 عادت 3 خرید 4 مشتری، مشتریان *adj* 1 سفارشی 2 سفارشی‌دوز

**customarily** /ˈkʌstəmərəli, US ˌkʌstəˈmerəli/ *adverb*
بە ئاسایی، زۆرتر، بەگشتی ◌ معمولاً

**customary** /ˈkʌstəməri, US -meri/ *adjective*
نەریتی، بەپێی نەریت، دەستووری، کەڤنەشۆپی، کەلەپووری، ئاسایی، خۆماڵی: *Is it customary to tip hairdressers in this country?* ◊ *She arranged everything with her customary efficiency* (customariness)

✧ (/'kʌstəˌmərinəs, US -ˌmerinəs/ *n*
سنتی، مرسوم، معمول

**custom-built** *adjective*
راسپاردەیی، کەسانە ✧ سفارشی

**customer** /kʌstəmə(r)/ *noun*
1 کڕیار(ی هەمیشەیی)، بکڕ، سەنیار، مشتەری: ◊ *one of the shop's best/biggest customers* ◊ *the customer service department* *The firm has excellent customer relations* 2 مرۆ، کەس، بنیادەم: *an awkward customer*
✧ 1 مشتری، خریدار 2 آدم

**customized** *adjective*
کەسانە، راسپاردەیی، تایبەتی ✧ سفارشی

**custom-made** = custom-built

**customs** /'kʌstəmz/ *noun, adjective*
*n* 1 داب‌ونەریت، کەڤنەشوێن، داب‌ودەستوور 2 گومرکانە، هاوردانە، باجی هاوردەیی: *customs duty/duties* 3 گومرک: *The customs have seized large quantities of smuggled heroin* *adj* گومرکی ✧ *a -stoms officer* ◊ *n* 1 آداب و رسوم 2 عوارض گمرک 3 گمرک *adj* گمرکی

**Customs and Excise** *noun*
بەڕێوەبەرایەتی باجی گومرکی (و باجە ناڕاستەوخۆیەکان)، بەڕێوەبەری حکومی بۆ کەمکردنەوەی باجەکانی گومرک ✧ ادارەی عوارض گمرکی

**customs duties** *noun, pl.*
گومرکانە، باجی گومرکی ✧ عوارض گمرکی

**customs house** *noun*
گومرک‌خانە، بەڕێوەبەری گومرک ✧ گمرک‌بندر

**customs inspection** *noun*
پشکنینی گومرکی ✧ بازرسی گمرکی

**customs union** *noun*
یەکێتی گومرکی ✧ اتحادیەی گمرکی

**cut**[1] /kʌt/ *noun*
1 بڕین، دابڕین، بڕیار، بڕشت 2 پارچە، کوت، بڕ، پل، لەت: *cheap cuts of stewing lamb* 3 بەش، کەرت، پشک 4 کون (بە شتێکی تیژ تێ‌کرابێ): *Using sharp scissors, make a small cut in the material* 5 برین، زام، ریش: *cuts and bruises on the face* 6 کەم‌بوونەوە، داکشان، هاتنەخوارەوە، دابەزین: *price/tax/job cuts* 7 سانسۆر، لابردن، قرتاندن، پەڕاندن 8 لێدان، پیاکێشان 9 بڕگە، بەر، بڕشت، تراش (جەواهیرات: ردنگە ئەڵمانی بنەڕەت بێ) ✧ 1 بریدگی، برش 2 شرحە، قطعە 3 سهم 4 سوراخ 5 زخم 6 کاهش، افت 7 سانسور 8 ضربە 9 تراش

**cut**[2] /kʌt/ *adjective*
1 بڕاو، لەت‌کراوە، قرتاو 2 تاشراو، هەڵکەنراو، داتاشراو 3 ورد، لەت‌لەت، تیکەتیکە، پارچەپارچە 4 کەمەوبوو، داشکاو 5خەساو، خەسێنراو، یەختەکراو 6 بڕگەبڕگە، ددانەددانە 7 کورتەوەکراو، قرتێنراو، پەڕێنراو، لابراو ✧ 1 بریدە 2 تراشیدە 3 خرد(شدە) 4 کاستە، کاهش‌یافتە 5 اختەشدە 6 دندان‌دار 7 خلاصەشدە

**cut**[3] /kʌt/ = past and past participle of cut

**cut and dried** *adjective*, also cut and dry
1 بێ‌چەندوچۆن، بێ‌ئەملاوئەولا، یەکلایی‌کەرەوە، یەکلایی‌یەوەبوو 2 ڕۆشن، روون، دیار 3 چەسپیو، نەگۆڕ، جێگیر 4 ئاسایی
✧ 1 قطعی 2 واضح 3 ثابت، لایتغیر 4 معمولی

**cut and thrust** *noun*
مشت‌ومڕ، دمەدمە، دەمەقرە، شەڕەقسە، کێشمەکێش، مشەرعێن، شەڕەچەلەحانێ ✧ مجادلە، مناقشە، بگومگو

**cutaneous** /kju:'teɪnɪəs/ *adjective*
پێستی، چەرمی، سەربە یان کار دەکاتە سەر پێست: *a cutaneous nerve* ◊ *cutaneous anthrax* (cutaneously *adv*) ✧ پوستی

**cutaway** /'kʌtəweɪ/ *noun*
1 بڕشت 2 کەوا یا کۆتی بەیانی (morning coat) ✧ 1 برش 2 کت فراک

**cutback** /'kʌtbæk/ *noun*
دابەزین، داشکان، کەم‌بوونەوە ✧ کاهش

**cute** /kju:t/ *adjective* (cuter, cutest)
1 خوێن‌شیرین، ژیکەڵە، ڕەزاسووک، لەدڵەوەنزیک، جوان، رنند، چەلەنگ، سەرنج‌ڕاکێش، لەبار، دڵڕفێن: *a cute little baby* 2 مدریک، زیرەک، زرنگ، وریا (cutely /kju:tli/ *adv*: سەرنج‌ڕاکێشانە، دڵڕفێنانە: *to smile cutely* cuteness /kju:tnəs/ *n*: 1 سەرنج‌ڕاکێشی، دڵڕفێنی 2 زیرەکی، وریایی) ✧ 1 ملیح، بانمک، لوند، جذاب 2 تیزهوش، ناقلا

**cut glass** *noun*
شووشەی بڕشت‌دار یان نەخشاو یان نەخش‌دار، شووشەی گوڵدار ✧ شیشەی تراش‌دار، شیشەی منقوش

**cuticle** /'kju:tɪkl/ *noun*
1 رووپێست، توێژ، توێخ، سەرپێست 2 پێستی دەوری نینۆک 3 پێستی رەق یان مردوو 4 (رووەک‌ناسی و گیانەوەرناسی) توێژە، توێخە (بنەڕەت: لە لاتین، *cuticula* چکۆلێنراوی *cutis* "پێست skin") ✧ 1 روپوست 2 پوست دور ناخن 3 پوست مردە 4 کوتیکل

**cuticular** /-'tɪkjʊlə/ *adjective*
رووپێستی، توێژی، توێخی، سەربە رووپێست ✧ وابستە بە روپوست

**cutie** /'kju:ti/ *noun*
(تافەرمی) کەسێکی سەرنج‌ڕاکێش یان دڵڕفێن، شیرین ✧ آدم جذاب

**cutin** /'kju:tɪn/ *noun*

(زینــدەکیمیا) کیــوتین، دەرەتــوێژی رووەک (ماکێکی مێوینی ئاوگیرەوەی توێژ یان تویخی گیاوگژ) ◌ کوتین

**cutis** /'kju:tɪs/ *noun*

ژێرپێســت، پێستی بنەوە (لە لاتینەوە بە واتای "skin") ◌ زیرپوست

**cutlass** /'kʌtləs/ *noun*

1 شمشێری (کورت) 2 سیکارد، چەپەچاغ ◌ 1 شمشیر 2 ساطور

**cutlassfish** *noun, pl.* same or cutlassfishes

(گیانەوەرناسی) شیرماسی [تۆخم *Trichiurus*] ◌ شمشیر ماهی

**cutler** /'kʌtlə(r)/ *noun*

چەقۆگــەر، چەقۆســاز، کێردســاز، چــەقۆفرۆش (بنەڕەت: لە *coutelier* فەرەنسی کۆن، لە *coutel* "knife"، لــە *cultellus* لاتــین، چکــۆلینراوی *culter* "ploughshare knife") ◌ چاقوســاز، چاقوفروش

**cutlery** /'kʌtləri/ *noun,* US flatware, silverware

(دەســت) کــارد و چنگــاڵ، کەرەســەی بــرین، کــەوچک و چنگاڵ، کارد: *a stainless steel Put the cutlery in the drawer ◊ cutlery set* ◌ کارد و چنگال

**cutlet** /'kʌtlət/ *noun*

کاتلێت (لەتــە گۆشــتێکی ئەســتوور ب.ت. هــی بەرخ یا بەراز) ◌ کاتلت

**cut-off** *noun*

1 کورتەرێ، لابڕ، سەربڕ، قەدبڕ 2 خاڵی دابڕین 3 بڕین، هەڵبڕین 4 ئامێر یان دەزگای هەڵبڕین (ئاو، ئێلیکتریسیتە و هتد)، شێرە 5 خاڵی کۆتایی 6 رادە ◌ 1 میانبر 2 نقطەی قطع 3 قطــع 4 ابــزار قطع 5 نقطەی نهایی 6 حد

**cut-out** *noun*

1 بڕشت: *a cardboard cut-out* 2 تەزووبڕ، فیوز، کلیل: *A cut-out stops the kettle boiling dry* ◌ 1 بریدە 2 فیوز، سویچ

**cut-price** *noun*

1 هــــەرزانفرۆشــــی: *a cut-price store/supermarket* 2 هەرزان، هــەرزانبایی: *cut-price goods/fares* ◌ 1 حراجی 2 ارزانقیمت

**cutpurse** = pickpocket

**cut-rate** = cut-price

**cutter** /'kʌtə(r)/ *noun*

1 دەزگا یان ئامرازی بڕین، تیغ، تیغە، بڕینگــەر. بڕە(ک)، بــڕەر 2 بەلــەم یــان گــەمی هــاتوچــۆ (نێوان کەشتی و کەنار) 3 (cutters، لە لێکدانا) ـبڕ، ـتاش: *a pair of wire cutters* 4 گــەمی یەکداراڵا 5 گەمی یان بەلەمی تۆپدار، بەلــەمی سەربە کەشتی شــەڕکەر ◌ 1 ماشین برش، تیغــە، برندە 2 قایق تردد 3 ـچین، ـبر 4 و 5 کاتر

**cutthroat** /'kʌtθrəʊt/ *adjective, noun,* also cutthroat trout

*adj* بێبەزەییانە، دڵڕەقانە، بێئەمان، دوژمنانە، دوژمنکارانە، نامرۆڤانە، توند، سەخت: *the cut-throat world of politics* 2 پیاوکوژ 1 *n* ماسییەخاتوونەی رۆژاوای ئەمریکای باکووری، بە خاڵ و نیشانی سوور و پرتەقاڵی لە بن شەویلکەی [*Salmo clarki*] ◌ *adj* بیامان، بیرحمانە، خصمانە *n* 1 قاتل 2 نوعی ماهی

**cutthroat razor** *noun*

تیغی ریشتاشین (بە دەمێکی درێژ و تیژەوە) ◌ تیغ سلمانی

**cutting**[1] /'kʌtɪŋ/ *adjective*

1 توانجاوی، تاڵ، ناخۆش، رەق، دڵبڕ: *a cutting remark* 2 تیژ، بڕا، بڕندە، بڕەک 3 سەخت، توند 4 تەزوو، سارد: *cutting winds* رنا؛ *adv* /'kʌtɪŋli/ cuttingly: بە شێوەیەکی نــاخۆش و تــاڵ، بــە تانــەوە، بــە تەشــەرەوە، بەتوانجەوە) ◌ 1 گزندە، نیشدار 2 برندە 3 شدید 4 سوزدار (باد)

**cutting**[2] /'kʌtɪŋ/ *noun*

1 بڕشت، بڕک 2 قەڵەمە، ریشە، نەمام، خەڵف، شەتڵ ◌ 1 بریدە 2 قلمە

**cutting board** = chopping board

**cutting edge** *adjective, noun*

*adj* 1 کاریگــەری، کارتێکــەر، شــوێندانــەر 2 نــووک، ســەر *n* 1 ســەرەتیر 1 پێشــەنگ، سەرکێش، vanguard ◌ *adj* 1 مؤثر 2 رأس *n* 1 پیکان 2 پیشگام

**cutting-room** *noun*

ژووری بژارکردن، (دیبوی) بڕشتگەری، ژووری رێکخستنی بڕشت و تیکەکانی فیلمێ ◌ اتاق تدوین

**cuttlebone** *noun*

ئێسکەدەپا: لەیکە یان قاوغی تووڕەکەماسی کە جاروبار وەک کەرەستە بۆ بریقاندنەوەی کانزا و چەشتەی باڵندەی نێوقەفەس بەکاردێت ◌ کاتلبون

**cuttlefish** /'kʌtlfɪʃ/ *noun, pl.* same or cuttlefishes, also cuttle

تووڕەکەماسی، دەپێ، دەپا، هەشت قۆڵی هەیە، شێوەی squid ی لەشیان دەدا [*Sepia* و تۆخمە کانی تر، دەستە Sepioidea] ◌ ماهی مرکب

**cutty sark** *noun*

(زۆرتر لە سکاتلەند) جل یان بەرگی کورت، ب.ت. جل یان بەرگی کورتی بنەوەی ژنانە ◌ لباس کوتاه undergarment

**cutty stool** *noun*

1 (زۆرتر لە سکاتلەند) چوارپایەی کورت 2 سەندەڵییێ لە کلیسەی سکاتلەندا کە تاوانبارانیان

تیا دادەنیشاند تا بکەونە بەر بەگژداچوون و سەرکۆنەی rebuke گشتی ◌ کاتل‌اسنول

**cutup** /ˈkʌtʌp/ *adjective*

(ناقەرمی) گاڵتەچی، قۆشمە، وەپێکەنین‌خەر ◌ مضحک

**cutwater** /kʌtwɔːˈtə(r)/ *noun*

1 ئاوبڕ(ە)، پێشکەی کەشتی، لووتکەی کەشتی 2 دەربەرپوی پوازئاسای کەلەی پرد، پوازەی کلە ◌ 1 دماغەی کشتی 2 کاتواتر

**cutworm** *noun*

جۆری کرمی نێو گڵ کە ئەو گژوگیایانەی سەر دەردێتن دەیان‌خوا (قەد و لاسکیان، لە خێزانی Noctuidae) ◌ کاتورم، کرم طوقه‌خوار

**cuvée** /ˈkjuːveɪ, French kyve/ *noun*, also cuvee

مەی نێو کوپ یان کووفە (بنەڕەت: لە فەرەنسە "vatful") ◌ کیووی

**cuvvette** /kjuːˈvɛt/ *noun*

کوێسەلە: 1 لوولە یان دەفر (لە توێژینگە بەکاردێتری) 2 قاپ یان کاسە یان ئاسەی شتنەوەی فیلمی وێنەگری ◌ کیووت

**CV** /ˌsiː ˈviː/ *abbreviation* curriculum vitae

**CVS** *abbreviation* chorionic villus sampling

**cwm** /kʊm/ *noun*

cirque ێ، ب.ت. هی چیا و کێوەکانی ویلز (بنەڕەت: ویلزی بە واتای "دۆڵ و دەرە") ◌ کوم

**CWO** *abbreviation* Chief Warrant Officer

**cwt.** *abbreviation* hundredweight, (Latin *centum* + English *weight*)

**-cy** *suffix*

پاشگر: دۆخ، ڕەوش، بار، ی، چوونیەتی، پلە، فەرمان، ئەرک، پۆست، دەستە، چین: *normalcy* ،*bankruptcy* ،*mendicancy* ،*magistracy* ،*chaplaincy* ،*baronetcy* (بنەڕەت: لە *-cia*, *-tia* لاتین و *-k(e)ia*, - *t(e)ia* یونانی) ◌ پسوند: حالت، وضع، چگونگی، مقام، رتبه، وظیفه، طبقه

**cyan** /ˈsaɪən/ *noun, adjective*

*n* ڕەنگی سایان (لە چاپدا بەکاردێتری) *adj* شینی تۆخ، شینی ئامال سەوز (بنەڕەت: لە *kuaneos* یونانی‌یەوە "شینی تۆخ "dark blue) ◌ *n* سیان *adj* فیروزه‌ای

**cyanamide** /saɪˈanəmaɪd/ *noun*

1 سیانامید، سایانامید $CH_2N_2$ - 2 calcium cyanamide ◌ سیانامید

**cyanate** *noun*

(کیمیا) سیانات: خوێ یان ئێستێری cyanic acid ◌ سیانات

**cyanic** *adjective*

سەربە یان پێوەندی بە سیانۆژێنەوە هەیە ◌ وابسته به سیانوژن

**cyanic acid** *noun*

ترش(ەڵۆک) یان ئەسید سیانۆژێن HOCN ◌ اسید سیانوژن

**cyanide** /ˈsaɪənaɪd/ *noun*

1 سیانۆر، سایانایدی (ئاوێتەیێکی کیمیایی کە ئاستی ژاراویتی زۆر بالایە؛ potassium cyanide؛ sodium cyanide 2 - cyanogen1 ◌ سیانور

**cyano** = cyan

**cyano- or cyan-** *prefix*

پێشگر: 1 سەربە ڕەنگی شین یان کەوو، شینی تونـد، کەووی تـۆخ: *cyanosis*؛ *cyanobacterium* 2 (سەربە) cyanide: 3 سیانۆژێن *cyanogenic* ،*cyanogenetic* ،cyanogens (لە *kuan(e)os* یونانی "شینی تۆخ یان توند") ◌ پیشوند: 1 وابسته به رنگ آبی 2 (وابسته به) cyanide 3 سیانوژن

**cyanobacteria** /ˌsʌɪənəʊbakˈtɪərɪə/ *noun, pl.*, sing. cyanobacterium

(زیندەناسی) وردەزیندەوەرەکانی micro-organism دیفیزنی (Cyanobacteria) کە قەوزە شین‌سەوزەکان دەگرێتەوە و دەتوانن ڕۆشنەپێکهات(ـن) photosynthesis بکەن و دوو فۆتۆسیستمیان photosystem هەیە، ئۆکسیژێنی گەردی بەرهەم دێنن و پێکهاتەی خانەیی‌یان پێش‌ناوکەیی‌یە prokaryote کە سەوزینە و ماک و مەتریالی ڕەنگی تریشی تیایە (هەروەها blue-green alga) ◌ سیانوباکتریا

**cyanocobalamin** /ˌsʌɪənə(ʊ)kəˈbaləmɪn/ *noun*, also -cobalamine

ڤیتامین $B_{12}$ (لە جەرگ، ماسی و هێلکەدا هەیە، کەمی‌یەکەی دەتوانێ ببێتە هۆی pernicious anaemia، لە cyano + cobalamin (تێکەڵەی cobalt و vitamin) ◌ ویتامین $B_{12}$

**cyanogen** /saɪˈanədʒ(ə)n/ *noun*

1 سیانۆژێن: کۆمەڵێکی یەک‌هاوهێزی CN– لە سایانایدەکاندا هەیە 2 جۆری گازی ژاراوی بێ‌ڕەنگی گڕکێش $(CN)_2$ ◌ سیانوژن

**cyanogenic** /ˌsʌɪənəˈdʒɛnɪk/ *adjective*, also cyanogenetic

سیانۆژێنیک، ئەتوانێ سیانۆر بەرهەم بێنێ، سیانۆرساز (وەک hydrogen cyanide؛ *a cyanogenetic glucoside* (cyanogenesis *n*) ◌ سیانوژنیک

**Cyanophyta** *noun, pl.*, also blue-green algae

قەوزە شین‌سەوزەکان: کۆمەڵێ لە ڕووەکە سەرەتایی‌یەکان کە نەوروبەری 1400 جۆری هەیە و لە سەرانسەری دنیادا بڵاو بوونەتەوە، ناوکی ڕاستەقینە و کلۆرۆپلاستیان نییە ◌ سیانوفیتا

**cyanosis** /ˌsaɪəˈnəʊsɪs/ *noun*

شینکە (پێست لەبەر کەمی ئۆکسیژێن؛

**debye** /də'bʌɪ/ *noun*
(کیمیا) دیبای: یەکەیێکی پێوانە، بەرامبەر بە $3.336 \times 10^{-30}$ ی میتری coulomb ۞ دیبای
**dec.** *abbreviation* deceased
خوالێخۆش‌بوو، رەحمەتی، بەهەشتی ۞ مرحوم
**Dec** *abbreviation* December
**deca-** /'dekə/ *prefix*
پێشگر: دە: *decasyllabic* (لە *deka* یۆنانیی‌یەوە "ten") ۞ پیشوند: ده
**decadal** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە decade وە هەیە ۞ وابسته به decade
**decade** /'dekeɪd, US dɪ'keɪd/ *noun*
1 دەیە، دە ساڵ 2 دەستەی دەدانەیی (بە ڕێگای فەرەنسیی کۆن و late Latin لە *deka* یۆنانیی‌یەوە "دە") ۞ 1 دهه، ده سال 2 گروه دەتایی
**decadence** /'dekədəns/ *noun*, also decadency /'dekədənsɪ/
داچوون، داکەوتن، لێکەوتن، داڕزان، شپرزەبوون، داشکان، هاتنەخواری، پووکانەوە، تیاچوون، نەمان، لێکەوتن، نزمەوەبوون، پاش‌داچوون، لێژبوونەوە، داخزان، دابەزین ۞ سقوط، زوال، تنزل، انحطاط
**decadent** /'dekədənt/ *adjective, noun*
*adj* ڕوولەداچوون، ڕوولەداشکان، ڕوولەپووکانەوە، داکەوتە، لێکەوتوو، پاش‌داچوو، لێژەوەبوو، نزمەوەبوو *n* کەسێکی لێکەوتوو یان نزمەوەبوو (*adv* decadently: نزمەوەبووانە، لێژەوەبووانە، بە شێوەیێ کە ڕوو لە داشکان بێ) ۞ *adj* رو به انحطاط، زایل‌شونده، منحط *n* آدم منحط
**decaf** /'di:kæf/ *noun*, also decaff
(ناڤەرمی) قاوەی بێ‌کافئین ۞ قهوه‌ی بدون کافئین
**decaffeinated** /ˌdi:'kæfɪneɪtɪd/ *adjective*
بێ‌کافئین ۞ بدون کافئین
**decaffeination** *noun*
کافئین‌لێ‌لابردن ۞ کافئین‌زدایی
**decagon** /'dekəgən, US -gɑ:n/ *noun*
(ڕووتەختی) دەگۆشەیی، دەلایی، دەپاڵوویی ۞ (سطح) ده‌ضلعی
**decagonal** /dek'ægənəl/ *adjective*
دەگۆشەیی، دەلایی، دەپاڵوویی ۞ ده‌ضلعی
**decagram** /dɪ'kægræm/ *noun*
دەگرەم ۞ ده‌گرم
**decahedral** *adjective*
دەڕوویی، دەلایی، دەپاڵوویی ۞ ده‌وجهی
**decahedron** /ˌdekə'hi:drən, US -'hed- *noun, pl.* decahedra or decahedrons
دەڕوویی، دەلایی، دەپاڵوویی ۞ ده‌وجهی
**decal** /'di:kæl/ *noun*, also transfer
وێنەی هەڵگێردراو، ترانسفێر ۞ عکس‌برگردان
**decalcification** *noun*
کالسیۆم‌لێ‌لابردن، بێ‌کلساندن ۞ کلسیم‌زدایی
**decalcified** *adjective*
(بەرد یان ئێسکێ) کالسیۆم‌لێ‌لابراو، بێ‌کلسێنراو ۞ کلسیم‌زدایی‌شده
**decalcifier** *noun*
کالسیۆم‌لێ‌لابەر، بێ‌کلسێنەر ۞ کلسیم‌زدا
**decalcomania** /dɪˌkalkə(ʊ)'meɪnɪə/ *noun*
وێنەی هەڵگێردراو ۞ عکس برگردان
**decalitre** /'dekəli:tə(r)/ *noun*, US decaliter, dekaliter
دەلیتری ۞ ده‌لیتری
**Decalogue** /'dɛkəlɒg/ *noun*
(کتێبی پیرۆز) دە دەستوور، دە فەرمان Ten Commandments (لە لایەن خوداوە بۆ مووسا؛ بنەڕەت: لە *dekalogos (biblos)* یۆنانی "(کتێبی) دە فەرمان"، لە *hoi deka logoi* "دە فەرمان") ۞ ده فرمان
**decametre** /'dekəmi:tə(r)/ *noun*, US decameter, dekameter
دە میتر ۞ ده متر
**decampment** *noun*
1 هەڵاتن، ڕاکردن، دەرچوون، دەربازبوون 2 چۆڵ‌کردن، بەجێ‌هێشتن، وازهێنان، تەرک‌کردن ۞ 1 گریز 2 ترک
**decanal** /dɪ'keɪn(ə)l, US 'dɛk(ə)n(ə)l/ *adjective*
1 سەربە dean یان deanery 2 سەربە لا یان بەری باشووری کۆڕی کلێسە ۞ دیکانال
**decanter** /dɪ'kæntə(r)/ *noun*
سوراحی، دۆلکە، تۆنگەمەی ۞ تنگ شراب
**decantation** *noun*
ڕۆکاری (بە مەبەستی جیاکردنەوەی خڵتە لە شلە) ۞ صفق
**decapitated** *adjective*
(لەش) بێ‌سەر، سەرلێ‌وەکراو، مل‌هەڵبڕاو، مل‌پەڕێنراو، سەرلێ‌وەبوو ۞ بدون سر، گردن زده‌شده
**decapitation** /dɪˌkæpɪ'teɪʃn/ *noun*
مل‌پەڕاندن، بێ‌سەرکردن، مل‌لێدان، سەرلێدان، سەرهەڵبڕین، سەرلێ‌کردنەوە، مل‌هەڵبڕین، سەربڕین ۞ گردن‌زنی
**decapitator** *noun*
مل‌پەڕێنەر، بێ‌سەرکەر، مل‌لێدەر، سەرلێدەر، سەرهەڵبڕ، سەرلێ‌کەرەوە، مل‌هەڵبڕ، سەربڕ ۞ گردن‌زن
**decapod** /'dɛkəpɒd/ *noun*
گیانەوەری دەریایی دەپێ (یان دەپا؛ *n* و *adjm*: decapodan: سەربە دەپێیان؛ decapodal *adj* decapodous *adj*: دەپێ، دەپا) ۞

جانور دەپا

**Decapoda** /ˌdɛkəˈpəʊdə/ *noun, pl.*
(گیانەوەرناسی) دەپێیان، دەپایان (crab ،shrimp و lobster کان) ۞ دەپایان

**decarbonization** *noun*
کاربۆنلێلابردن، بێخەڵووزاندن ۞ کربن‌زدایی

**decarbonizer** *noun*
کاربۆنلێلابەر، بێخەڵووزێنەر، خەڵووزبڕ ۞ کربن‌زدا

**decarburization** *noun*
کاربۆنلێلابردن، بێخەڵووزاندن (لە ئاسن یان پۆڵا) ۞ کربن‌زدایی

**decastyle** /ˈdɛkəstʌɪl/ *adjective*
(هەیوان یان پەرستگەیێ) دەستوونە، دەکۆڵەکەیی ۞ دەستونی

**decasyllabic** /ˌdɛkəsɪˈlabɪk/ *adjective*
دەبڕگەیی، دەکەرتەیی ۞ دەهجایی

**decasyllable** /ˈdɛkəsɪləbl/ *noun*
هەڵبەستی دەبڕگەیی، هۆنەی دەکەرتەیی ۞ شعر دەهجایی

**decathlete** /dɪˈkæθliːt/ *noun*
وەرزشکاری دەیانە، وەرزشوانی دەیانە ۞ ورزشکار دەگانە

**decathlon** /dɪˈkæθlɒn / *noun*
دەوەرزشە، دەملانێ، وەرزشە یا پێشبڕکێ دەیی‌یەکان (دەیانەکان، biathlon ،heptathlon ،pentathlon ،tetrathlon (triathlon ۞ ورزش‌های دەگانە

**decay** /dɪˈkeɪ/ *noun*
1 خراپبوون، گەنین، گنخان، رزین، پووان، دافەوتان، داقەنین، خورانەوە، رەشداگەڕان 2 (فیزیک) لێکبوونەوە، لێکهەڵوەشان 3 وێرانبوون، کاولبوون، تێکدران، تێکچوون، داشکان، داچوون، داخزان، لێژەوەبوون، هەڵتەکان، لێکەوتن، داکەوتن، داشکان، هاتنەخوارێ، پووکانەوە 4 تیاچوون، قڕتێکەوتن، لەنێوچوون، نەمان 5 لاوازبوون، سستی، پێچوون ۞ 1 فساد، گندیدگی، پوسیدگی 2 (فیزیک) واپاشی، تلاشی 3 انهدام، خرابی، انحطاط 4 انقراض 5 ضعف

**decayed** *adjective*
خراپبوو، گەنیو، گنخاو، رزیو، پوواو، دافەوتاو، داقەنیو، خوراو، رەشداگەڕاو ۞ فاسد، پوسیدە، گندیدە

**decaying** *adjective*
1 خراپبوو، گەنیو، گنخاو، رزیو، پواو، دافەوتاو، داقەنیو، خوراو، رەشداگەڕاو 2 روولەداچوون، روولەداشکان، روولەپووکانەوە، لێژەوەبوو ۞ 1 فاسد، پوسیدە، گندیدە 2 رو بە انحطاط

**decease** /dɪˈsiːs/ *noun*
(کۆن) مردن ۞ فوت

**deceased** /dɪˈsiːst/ *noun, adjective*
*n* (the deceased) مردوو (ب.ت. بەم زووانە) *adj* خواڵێخۆشبوو، بەهەشتی، رەحمەتی ۞ *n* متوفی *adj* مرحوم

**decedent** /dɪˈsiːd(ə)nt/ *noun*
(مافی ئەمریکا، کەسێکی) مردوو ۞ متوفی

**deceit** /dɪˈsiːt/ *noun*
فروفێڵ، تەڵەکەبازی، لەخشتەبردن، گزەونی، فێڵلێکردن، قەڵەودەلە، فریودان، هەڵفریواندن، دەسبڕی، تەفرە، دهۆ، فێڵ، تەڵەکە، درۆ: *He was accused of lies and deceit* ◊ *Everyone was involved in this web of deceit* ۞ تقلب، فریب، حقەبازی، کلاەبرداری، نیرنگ، دروغ

**deceitful** /dɪˈsiːtfl/ *adjective*
فێلاوی، بەفێڵ، تەڵەکەباز، دووزمان، گزەون، بەقەڵەودەلە، فێڵەباز، فریودەر، ئاخوڕخوار، دەسبڕ، فێلاوییانە، فریودەرانە، لەخشتەبەر، فریودەرانە: *The government were accused of being hypocritical and deceitful* ۞ حقەباز، متقلب، حیلەگر، کلاەبردار، حیلەگرانە، فریب‌آمیز

**deceitfully** /-fəli/ *adverb*
فێلاوییانە، بە فێڵەوە، بە فروفێڵەوە ۞ با حقەبازی

**deceitfulness** /dɪˈsiːtflnəs/ *noun*
فروفێڵ، تەڵەکەبازی، لەخشتەبردن، خەڵەتاندن، تەفرەدان، زۆڵی، دووزمانی، گزەونی، فێڵلێکردن، قەڵەودەلە، فریودان، هەڵفریواندن، دەسبڕی، دهۆ، تەفرە، فێڵ، تەڵەکە ۞ حقەبازی، تقلب، فریب

**deceiver** *noun*
مرۆی دەسبڕ، فریودەر، لەخشتەبەر، خەڵەتێنەر، زۆڵ، فێڵەباز، فێلاوی، گزەون ۞ آدم متقلب، گول‌زن

**deceleration** /ˌdiːseləˈreɪʃn/ *noun*
کەمبوونەوەی خێرایی، خاوبوونەوە، سووکبوونەوە، هێواشکردنەوە، سووککردنەوە ۞ کاهش سرعت

**deceleraor** *noun*
کەمکەرەوەی خێرایی، خاوکەرەوەی خێرایی ۞ کاهندەی سرعت

**December** /dɪˈsembə(r)/ *noun*
کانوونی یەکەم، سەرماوەز، دیسامبر (دوازدەیەمین مانگی ساڵی زایینی یان لە رۆژمێری Gregorian calendar دا، لەنێوان November و January، لە بنەڕەتا دەیەمین مانگی ساڵی رۆمی) ۞ دسامبر

**Decembrist** *noun*
کەسێ کە لە راپەڕینە سەرنەگرتووەکەی دیسامبری 1825 بە دژی نیکۆلاسی یەکەم ئیمپراتۆری رووسیە بەشداری کردووە ۞ دسامبریست

**decemvir** /dɪ'semvə(r)/ *noun*
ئەندامی دەستەی دەکەسەی رۆم کە ئەرکی دەسەلات و قانوونیان پێ سپێردرابوو (decemviral *adj*) ◊ دسیمویر

**decemvirate** /dɪ'semvərɪt/ *noun*
(پلەوپایەی) دەکەسەی قانووندانەری رۆم ◊ دسیمویریت

**decency** /'di:snsi/ *noun, pl.* decencies
1 لێهاتوویی، لێوەشاوەیی 2 بەشەرمی 3 رەوشت، ماقوولی، ئەدەب، گەورەیی 4 (decencies) ڕێوشوێن، داب‌ودەستوور، دەستوور ◊ 1 شایستگی 2 محجوبیت 3 نزاکت، لطف 4 (در جمع) آداب، اصول

**decennary** /dɪ'senərɪ/ *noun, pl.* decennaries
ماوەی دەسال ◊ مدت ده سال

**decennial** /dɪ'senɪəl/ *adjective, noun*
دەساڵە، دەساڵ جارێ ( decennially /dɪ'senɪəli/ *adv*) ◊ دەساله

**decennium** /dɪ'seni:əm/ *noun, pl.* decenniums or decennia
ماوەی دەسال، دەیە، decade ◊ مدت ده سال

**decent** /'di:snt/ *adjective*
1 بەڕێز، بەئابڕوو، بەشەرم، بەڕێزانە، بەئابڕووانە، بەرەوشتانە، بەئەدەبانە 2 لێوەشاو، لێهاتوو 3 بەجێ، ژیرانە، پەسندکراو، ئاقڵانە، بەڕێوجێ 4 خۆداپۆشیو، پۆشتە، ڕێک‌وپێک، پاک‌وخاوێن 5 باش، چاک ◊ 1 محترم، محجوب، محترمانه، مؤدبانه 2 شایسته 3 معقول 4 پوشیده، آراسته 5 خوب

**decently** /'di:sntli/ *adverb*
1 بە شێوەیێکی ژیرانە یان بەڕێوجێ، لێوەشاوانە، بە شێوەیێکی لێوەشاو 2 بە ڕێزەوە ◊ 1 به طور معقول یا شایسته 2 محترمانه

**decentralization** /ˌdi:ˌsentrəlaɪ'zeɪʃn, US -lə'z-/ *noun*
گواستنەوەی دەسەلات لە حکومەتی ناوەندی‌یەوە بۆ حکومەتی ناوچەیی یان هەرێم: *the decentralization of power* ◊ تمرکززدایی

**decentralized** *adjective*
پرش‌وبلاو، لێک‌بلاو ◊ غیرمتمرکز

**deception** /dɪ'sepʃn/ *noun*
فروفێڵ، تەڵەکەبازی، لەخشتەبردن، خەڵەتاندن، گزەونی، فێڵ‌لێکردن، قەلەودەلە، فریودان، تەفرە، هەڵفریواندن، دەسبڕی، دەغۆ، فێڵ، تەڵەکە، درۆ، دەلەسە، درۆ و دەلەسە، چاووڕاو ◊ فریب‌کاری، تقلب، فریب، دروغ

**deceptive** /dɪ'septɪv/ *adjective*
فریودەر، لەخشتەبەر، هەڵفریوێنەر، خەڵەتێنەر، فێلاوی، بەهەڵەدابەر: *a deceptive advertisement* ◊ فریبنده، گول‌زننده، فریب‌آمیز

**deceptively** /dɪ'septɪvli/ *adverb*
فریودەرانە، لەخشتەبەرانە، خەڵەتێنەرانە ◊ بە طور فریبنده

**deci-** /'desɪ-/ *prefix*
پێشگر: دەیەک، دەیەکی بەشێ: *decilitre*، *decimeter* (بنەڕەت: لە لاتین *decimus* "tenth") ◊ پیشوند: یک‌دهم

**decibel** /'desɪbel/ *noun,* abbreviation: dB
دیسیبێل، دێسی‌بێل، دیسیبل (یەکەی پێوانی تیژی دەنگ، بەرامبەر بە دەیەکی bel ێ) ◊ دسی‌بل

**decided** /dɪ'saɪdɪd/ *adjective*
1 سوور، شێلگیر، پتەو، دڵنیا، بڕا، بەبڕیار، یەکلایی‌کەرەوە، شێلگیرانە، لێبڕاوانە: *a decided advantage* 2 دیار، دیاری‌کراو، ئاشکرا، ڕوون، لەبەرچاو، بەدیارەوە ◊ 1 مصمم، قاطع، قاطعانه 2 مشخص، معلوم

**decidedly** /dɪ'saɪdɪdli/ *adverb*
لێبڕاوانە، شێلگیرانە، بێ‌گومان، بێ شک و دوودڵی، بە دڵنیاییەوە: *'I won't go,' she said decidedly.* ◊ قاطعانه، قطعاً

**decider** /dɪ'saɪdə(r)/ *noun*
1 دیاری‌کەر، یەکلایی‌کەرەوە، بڕێنەرەوە، بڕیاردەر، 2 (پێشبڕکێ، یاری و هتد) بڕیاردەر، دیاری‌کەر، یەکلایی‌کەرەوە: *the international title -cider against Holland* ◊ 1 تعیین‌کننده، تصمیم‌گیرنده 2 بازی تعیین‌کننده

**deciding** *adjective*
دیاری‌کەر، یەکلایی‌کەرەوە، بڕیاردەر، لایێ بەلاداخەر، بڕێنەرەوە ◊ تعیین‌کننده

**deciduous** /dɪ'sɪdʒuəs, US -dju-/ *adjective*
1 (لەمەڕ دار یان دەوەنێ) وەریو، گەڵاوەریو، گەڵاڕێز، گەڵاوەرێن، هەڵوەریو، کەوتوو، سەرعەرزکەوتوو: ◊ *deciduous leaves* (زۆرتر لە بەرامبەری evergreen) 2 ئاماژە بە ددانی شیری گوان‌دارێ دەکا کە دوای ماوەیێ دەکەوێ: *deciduous scales* (deciduously *adv*: وەریوانە، هەڵوەریوانە، کەوتووانە؛ -ciduousness *n*) ◊ 1 برگ‌ریز، افتنده 2 دسیدوس

**deciduous teeth** *noun*
ددانە (زوو)کەوتووەکان ◊ دندان‌های شیری

**decigramme** /'desəgræm/ *noun,* US decigram
دیسی‌گرەم (دەیەکی گرەم) ◊ دسی‌گرم

**decilitre** /'desɪli:tə(r)/ *noun,* US deciliter
دیسی‌لیتر، دەسی‌لیتر (دەیەکی لیتر) ◊ دسی‌لیتر

**decillion** *noun*
دیسیلیۆن، دەسیلیۆن (لە ئەمریکا 1 بە 33 سیفر لە پێشەوە و لە ئینگلتەرە و ئەڵمانیا 60 سیفر لە پێشیەوە) ◊ دسیلیون

**decimal** /'desɪml/ *adjective, noun*
*adj* دەیی *n* کەرتی دەیی (لە *decimalis* لاتینی

نوێ (adj)، لە *decimus* "دەیەم". decimally (*adv*) ۞ *adj* دەدهی، اعشاری *n* کسر اعشاری

**decimal fraction** *noun*
کەرتی دەیی یان دیسیمال (بڕوانە vulgar fraction) ۞ کسر اعشاری

**decimalization** /ˌdesɪməlaɪˈzeɪʃn, US -ləˈz-/ *noun*
بە شێوەی دەیی نووسین، کردنەدەیی، دەیاندن ۞ دسیمالیزاسیون

**decimalized** *adjective*
دەیی ۞ دەدهی

**decimal place** *noun*
جێگا یان شوێنی دەیی (شوێنی ژمارەیێ لە لای ڕاستی خاڵی دەیی): *The figure is accurate to two decimal places* ۞ محل ممیز

**decimal point** *noun*
خاڵی دەیی (کە لە ئینگلیسیدا بە خاڵ دادەنرێ، وەکوو 0.61) ۞ ممیز

**decimal system** *noun*
دەزگای دەیی، سیستمی دەیی ۞ دستگاه دەدهی یا اعشاری

**decimation** /ˌdesɪˈmeɪʃn/ *noun*
1 (لە ڕۆمی کۆندا) کوشتنی یەکلەدەیی یان دەیەکی (سەربازان بۆ بێفەرمانی) 2 تیاچوون، لەنێوچوون، هەڵتەکان، نەمان، بەقوڕگیران، فەوتان، قەلاچۆ، قڕتێکەوتن، هیچنەهێشتن ۞ 1 دسماسیون 2 نابودی

**decimator** *noun*
تیابەر، قڕتێخەر، هەڵتەکێنەر، فەوتێنەر، وێرانکەر ۞ نابودگر

**decimetre** /ˈdesɪmiːtə(r)/ *noun*, US decimeter
دیسیمیتر، دەسیمیتر (دەیەکی میتر) ۞ دسی‌متر

**decipherable** *adjective*
لەدۆزینەوەهاتوو، لەخوێندنەوەهاتوو، لێکدەدرێتەوە، دەدۆزرێتەوە، دەخوێنرێتەوە ۞ قابل کشف

**decipherment** *noun*
دۆزینەوە، دیتنەوە، هەڵێنان، لێکدانەوە، پەیداکردن، خوێندنەوە ۞ کشف رمز

**decision** /dɪˈsɪʒn/ *noun*
1 بڕیار، بڕیاردان، یەکلاییبوونەوە، دوایی‌پێهاتن، بڕینەوە، ساغبوونەوە، لێبڕان، توانایی بڕیاردان، هێزی بڕیاردان: *We need a decision on this by next week* 2 بڕیار، دەستوور، فەرمان، فەروار (decisional *adj*) ۞ 1 تصمیم، عزم. تصمیم‌گیری، قدرت تصمیم‌گیری 2 رأی، حکم، فتوا

**decision-maker** *noun*
بڕیاردەر، بڕینەرەوە، دیاریکەر، یەکلاییکەرەوە (decision-making *n*: بڕیاردان، لێبڕان، بڕیاردەری) ۞ تصمیم‌گیرندە

**decisive** /dɪˈsaɪsɪv/ *adjective*
دیاریکەر، یەکلاییکەرەوە، بڕینەرەوە، بڕیاردەر، بڕا، یەکلاییکەرەوە، بەلایێکداخەر، بەبڕیار، شێلگیر، لێبڕاو، سوور، شێلگیرانە، مسۆگەر، بێنەملاونەولا: *a decisive manner* ◊ *decisive battle/factor/victory* ◊ *a decisive superiority* ◊ *She has played a decisive role in the peace negotiations* ۞ تعیین‌کنندە، قاطع، قاطعانە، قطعی، مسلم

**decisively** /dɪˈsaɪsɪvli/ *adverb*
شێلگیرانە، لێبڕاوانە: *She shook her head decisively* ۞ قاطعانە

**decisiveness** /dɪˈsaɪsɪvnəs/ *noun*
سووربوون، شێلگیری، یەکلاییکەرەوەیی، بەلایێکداخەری، بێچەندوچۆنی، بێنەملاونەولابوون ۞ قاطعیت

**deck** /dek/ *noun*
1 (سەر)پشتی کەشتی 2 تەرک، عەرز 3 (پاس) نهۆم، مەرتەبە 4 دەستەبەر، بەستە، دەست 5 دیک (پارچەیێ لە دەزگایێ کە بۆ لێدانی کاسێتی موسیقا و هتد بەکاردێترێ) 6 (ئافەرمی، ئەمریکا) بەستەی بەنگ (-decked *adj*) ۞ 1 عرشە 2 کف 3 (اتوبوس) طبقە 4 دستەی ورق 5 دک 6 پاکت مواد مخدر

**deckchair** /ˈdektʃeə(r), US -tʃer/ *noun*
کورسی کەنار، کورسی قەدکراو یان دانووشتاو ۞ صندلی تاشو

**decker** *noun*
کەشتی پشتدار یان خاوەن دیک و (سەر)پشت ۞ کشتی عرشەدار

**deckhand** /ˈdekhænd/ *noun*
مەلەوانی ئاسایی، ئەندامی کارکەرانی (سەر پشتی) کەشتی ۞ جاشو

**deckhead** /ˈdekhænd/ *noun*
بەشی ژێرەوەی (سەر)پشتی کەشتی ۞ قسمت تحتانی عرشەی کشتی

**deckhouse** /ˈdekhaʊs/ *noun*, *pl.* deckhouses
دیوی (سەر)پشتی کەشتی ۞ اتاق روی عرشەی کشتی

**decking** /ˈdekɪŋ/ *noun*
کەلوپەلی سازکردنی (سەر)پشتی کەشتی ۞ لوازم ساختن عرشەی کشتی

**deckle** /ˈdɛk(ə)l/ *noun*
1 (چوار)چێوەدارێنی دەوری لێوارەکانی قالبی کاغەزسازی (بە دەست)؛ هەروەها هەریەک لەو دوو بەست یان باریکەیەی band دەوری لێوارەکانی سیم و تێلەکانی دەزگای کاغەزسازی، بۆ مەهار و کۆنترۆڵی ئەندازەی کاغەز بەکاردێترێ 2 = deckle edge ۞ دکل

**deckle edge** *noun*
لیواری نارێک و نەبڕاوی تەبەق یان تەڵشە کاغەزی (دەس‌ساز) a sheet of paper، ئەویش بە دیکل (deckle-edged *adj*) ◌ دکل اج

**deck quoits** *noun*
(یاری) سنگ و ئاڵقەی (سەر)پشتی کەشتی ◌ دک کوئیتس

**deck shoe** *noun*
کەوشی (سەر)پشتی کەشتی (بن‌نەرم و نەخز) ◌ دک شو

**deck tennis** *noun*
تێنیس یان تەنیسی (سەر)پشتی کەشتی (دووکەسە) ◌ دک تنیس

**declamation** /ˌdekləˈmeɪʃn/ *noun*
دیکلەمە، دووان، خوێندنەوە (بە هەست و سۆزەوە) ◌ دکلمه

**declamatory** /dɪˈklæmətəri, US -tɔːri/ *adjective*
فەرمی، گەرم‌وگوڕانە، بەشکۆ، بەزاژوفەڕ، ڕەوان‌بێژانە، تەقوڕەق: *declamatory speeches* ◌ پرطمطراق، فصیحانه، تصنعی

**declaration** /ˌdekləˈreɪʃn/ *noun*
1 ڕاگەیاندن، ڕاگەهاندن، بانگ، بانگ‌ڕاهێشتن، دانەزانین، ئاگادارکردنەوە، بانگەواز 2 دەربڕین، ئاشکراکردن، وتن، ڕاگەیاندن‌نامە، ئاگاداری، داخویانی، بەیان‌نامە 3 ئاگانامە، ڕاگەیاندن‌نامە (باج و هتد) ◌ 1 اعلام، اعلان 2 اظهار، بیان، بیانیه، اعلامیه 3 اظهاریه

**the Declaration of Independency** *noun*
ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی (لە 4ی ژووڵای 1776 کە ئەمریکا سەربەخۆیی خۆی لە ئینگلتەرە ڕاگەیاند) ◌ اعلام استقلال

**declarative** /dɪˈklærətɪv/ *adjective*, also declaratory
(ڕێزمان) ئاگاداری، ڕاگەیێنەرانە ◌ (دستور زبان) اخباری، خبری

**declared** /dɪˈkleəd, US -ˈklerd/ *adjective*
ڕاگەیێنراو، وتراو، دەربڕاو، ئاشکراکراو؛ ئاشکرا، دیار، لەبەرچاو، professed: *the government's declared intention to reduce crime* (declaredly *adv*: بە ئاشکرایی، بە ڕاشکاوی) ◌ اعلام‌شده، اظهارشده؛ علنی

**declarer** *noun*
ڕاگەیێنەر، ڕاگەیەنەر ◌ اعلام‌کننده

**declassification** /ˌdiːˌklæsɪfɪˈkeɪʃn/ *noun*
ئاشکراکردن، بلاوکردنەوە، دەرخستن، پەردەلێلادان، دانەدەری ◌ غیرمحرمانه‌سازی، علنی‌سازی

**declassified** *adjective*
ئاشکرا، نانهێنی، چیتر نهێنی نییە ◌ غیرمحرمانه

**declension** /dɪˈklenʃn/ *noun*
1 (ڕێزمان) گەردان، گەردان‌کردن، گەرداندن (ناو، جێناو و ئاوەڵناو) 2 داچوون، نشوستی، داکەوتن، داشکان (declensional *adj*) ◌ 1 (دستور زبان) صرف، تصریف 2 تنزل، انحطاط

**declinable** /dɪˈkaɪnəbl/ *adjective*
لەگەردان‌هاتوو، شیاوی گەرداندن ◌ قابل صرف

**declinate** *adjective*
چەمیو، لار، خوار، لێژ، تەلان ◌ منحنی، شیب‌دار

**declination** /ˌdeklɪˈneɪʃ(ə)n/ *noun*
1 (فیزیک) لادانی میلی لادۆز (ڕۆژهەلات و ڕۆژاواکەی لە باکووری ڕاستەقینەوە)، گۆشەی لادان 2 لادان، داشکانەوە، داچوون، داخزان، لێ‌کەوتن: *moral declination* 3 (ئەمریکا) بەرپەرچ‌دانەوە (ی فەرمی؛ declinational *adj*: سەربە declination) ◌ 1 (فیزیک) زاویه‌ی انحراف 2 انحراف، تمایل، انحطاط، افت 3 امتناع

**declinatory** /dɪˈklaɪnətəʊri/ *adjective*
بەرپەرچ‌دانەوەیی ◌ مبنی بر امتناع

**declinature** dɪˈklaɪnətʃə(r)/ *noun*
بەرپەرچ‌دانەوە، نەڵێ‌کردن، ڕەت‌کردنەوە، نەویستن، خۆلێ‌لادان، خۆلێ‌پاراستن، خۆلێ‌بواردن ◌ امتناع

**decline** /dɪˈklaɪn/ *noun*
کەم‌بوونەوە، داشکان، هاتنەخواری، داچوون، داکەوتن، داقنین، تیاچوون، نەمان، نزمەوەبوون، فاق‌دان، فشەڵ‌هێنان، پاش‌داچوون، دانەدواوە، لێژبوونەوە، داخزان، دابەزین، پووکانەوە، پووچانەوە: *a rapid/sharp/gradual decline* ◌ کاهش، تنزل، سقوط، زوال، افول

**declining** *adjective*
ڕوولە داشکان، ڕوولە نەمان، ڕوو لە داکەوتن، ڕوولە داچوون، ڕوولە پووکانەوە: *her declining years* ◌ رو به زوال

**declinometer** *noun*
لادان‌پێو ◌ انحراف‌سنج

**declivitous** dɪˈklɪvətəs/ *adjective*
لێژ، لار، سەرەوخوار، تەلان، لاپێ ◌ شیب‌دار

**declivity** /dɪˈklɪvɪti/ *noun, pl.* declivities
لێژی، نشێوی، سەرەوخواری، سەربەرەوخوارە، ئاوڕێژن، سەربەرەوژێر، لاری، کوور، گۆرەنیش (declivous *adj*: لێژ، لار، سەرەوخوار، تەلان، نشێو، لاپێ) ◌ سرازیری

**decoction** /dɪˈkɒkʃən/ *noun*
1 (دەرمانی گیایی) کوڵاندن 2 کوڵاو، ناوگ‌گیری ◌ 1 جوشاندن 2 جوشانده

**decoder** /ˌdiːˈkəʊdə(r), US -ˈkoʊ-/ *noun*
کۆددۆز، کۆدهەڵێن، دیکۆدێر، کۆدلێکدەرەوە ◌ رمزگشا

**decoding** *noun*
کۆددۆزی، کۆدلێکدانەوە، لێکدانەوەی کۆد، کۆدهەڵێنان ◌ رمزگشایی

**décolletage** /ˌdeɪkɒlˈtɑːʒ, US -kɑːləˈt-/ *noun*
(فەرنسی) کراسی یەخەشۆڕ ◇ پیراهن دکلته

**décolleté** /deɪˈkɒlteɪ, US ˌdeɪkɑːlˈteɪ/ *adjective, noun*
*adj* (فەرنسی، کراس و هتد) دیکەلتە، یەخەشۆڕ، ملیوانشۆڕ *n* ژنی یەخەشۆڕلەبەرکردوو (یان پۆشیو) ◇ *adj* دکلته *n* زن دکلتەپوشیده

**decolonization** /diːˌkɒlənaɪˈzeɪʃn, US -ˌkɑːlənəˈz-/ *noun*
نەهێشتنی داگیرکاری یان کۆلۆنیالیزم، سەربەخۆیی‌دان بە کۆلۆنی‌یەکان ◇ استعمارزدایی

**decolorant** *adjective*
رەنگبەر، رەنگلابەر ◇ رنگزدا

**decolorization** *noun*
رەنگلابردن، رەنگبەری، رەنگلێ‌کردنەوە، رەنگسڕینەوە ◇ رنگزدایی

**decomposability** /ˌdiːkəmpəʊzəˈbɪlɪtɪ/ *noun*
لەشی‌بوونەوەهاتوویی، لەگەنین‌هاتوویی ◇ تجزیەپذیری، فسادپذیری

**decomposable** /ˌdiːkəmˈpəʊzəbl/ *adjective*
لەشی‌بوونەوەهاتوو، لێک‌هەڵدەوەشێ، دەڕزێ، دادەڕزێ، لەگەنین‌هاتوو، بۆگەن دەبێ ◇ تجزیەپذیر، فسادپذیر

**decomposed** *adjective*
شی‌یەوەبوو، لێک‌هەڵوەشاو، داوەشاو، دابەش‌بوو ◇ تجزیەشده

**decomposition** /ˌdiːkɒmpəˈzɪʃn, US -kɑːm-/ *noun*
1 لێک‌کردنەوە، لێک‌هەڵوەشاندن، پارچەپارچەبوون، داوەشان، دابەش‌بوون، شی‌بوونەوە، لێک‌بوونەوە، لێک‌هەڵوەشان 2 بۆگەن‌بوون، بۆن‌گرتن، خراپ‌بوون، گەنین، پوان، دافەوتان، دافەتران، داڕزان، داوەشان: *the decomposition of organic waste* ◇ 1 تجزیە، واپاشی 2 گندیدگی، فساد

**decompression** /ˌdiːkəmˈpreʃn/ *noun*
1 کەم‌کردنەوەی پەستان یان گوشار (ی هەوا) 2 (کامپیوتێر) گەڕاندنەوەی فایلەکان بۆ شێوەی پێشوویان ◇ 1 فشارزدایی، تقلیل فشار 2 (کامپیوتر) دی‌کامپراسیون

**decompression chamber** *noun*
ژوورۆچکەی کەم‌کردنەوەی گوشار یان پالەپەستۆ ◇ اتاقک فشارزدایی

**decompression sickness** *noun*, also bends or caisson disease
بێندز (لەگەڵ aeroembolism بەراوردی بکە) ◇ بیماری کیسون

**decongestant** /ˌdiːkənˈdʒestənt/ *adjective, noun*
*adj* لووت‌بەردەر *n* دەرمانی بەردانی کپی لووت ◇ دیکانجستانت

**deconsecration** *noun*
کردنەدنیایی، پیرۆزی‌سڕی، لایەنی پیرۆزی لێ‌سڕینەوە (خانوو) ◇ تقدس‌زدایی

**deconstruction** /ˌdiːkənˈstrʌkʃn/ *noun*
(فەلسەفە، رەخنە، وێژە و هتد) پێکهاتەشکێنی: تیۆرییێ کە پێی‌وایە تەنیا روون‌کردنەوەی واتایەکی چەسپیوی پارچە نووسراوەیێ تەواو نیە. بەڵکوو پێ‌دادەگرێتەسەر رۆڵی خوێنەر بۆ بەرهەم‌هێنانی واتا ◇ واسازی، ساختارشکنی، ساخت‌شکنی

**deconstructionist** *noun, adjective*
*n* پێکهاتەشکێن، بنیات‌شکێن *adj* پێکهاتەشکێنانە: *a deconstructionist critic/approach* ◇ *n* واساز، ساختارشکن *adj* ساختارشکنانە

**decontamination** /ˌdiːkənˌtæmɪˈneɪʃn/ *noun*
نەهێشتنی پیسی، پیسی‌لابردن، لێ‌کردنەوە، خاوێن‌کردنەوە ◇ آلودگی‌زدایی، رفع آلودگی

**decontrol** /ˌdiːkənˈtrəʊl/ *noun*, also deregulation
لەژێر چاودێری حکومەت لابردن، کۆنترۆڵ‌هەڵگرتن، مەهارنەهێشتن، مەهارسڕی، ئازادکردن (ب.ت. بەدرێژایی شەڕ یان دۆخێکی تەنگەتاوی‌دا) ◇ حذف نظارت دولت، مهارزدایی

**décor** /ˈdeɪkɔː(r), US deɪˈkɔːr/ *noun*
دەس‌پیاهێنان، رازاندنەوە، دیکۆر ◇ دکور

**Decorated style** *noun*
شێوازی گۆتیکی رازێنراو ◇ سبک گوتیک مزین

**decoration** /ˌdekəˈreɪʃn/ *noun*
1 جوان‌کردن، رازاندنەوە، خەملاندن، ماڵ‌ڕاخستن، نەخشاندن، کەلوپەل یان شتی رازاندنەوە، شت‌ومەکی جوان‌کردن 2 میداڵ یان نیشان (ی شانازی) 3 رەنگ‌کردن (ی خانووبەرە، لێدانی کاغەز بە دیوار، میچ و هتد بۆ جوانی) 4 (decorations) نەخش‌ونیگار، شت‌ومەکی جوان‌کردن یان رازاندنەوە، جوانەمەنی ◇ 1 تزیین، آذین، آذین‌بندی 2 مدال یا نشان 3 نقاشی 4 (در جمع) تزیینات

**Decoration Day** = Memorial Day

**decorative** /ˈdekərətɪv, US ˈdekəreɪtɪv/ *adjective*
1 بۆ جوانی، بۆ رازاندنەوە، نەخشێنەر 2 سەربە decoration ◇ زینتی

**decorative arts** *noun, pl.*
هونەرە جوان‌کاری یا رازێنەرە یا نەخشێنەرەکان ◇ هنرهای تزئینی

**decorator** /ˈdekəreɪtə(r)/ *noun*
1 ماڵ‌نەخشێن، رازێنەر، جوان‌کار، خەملێنەر،

نەخشینەر 2 رەنگ‌کار (ماڵ) ◌ 1 طراح داخلی، آذین‌بند 2 نقاش ساختمان

**decorous** /'dekərəs/ *adjective*

1 بەڕەوشت، بەحەیا، بەشەرم، مەند، ماقووڵ، لێوەشاو: *a decorous kiss* 2 بەڕێ‌وجێ، گونجاو، بەجێ (**decorously** /'dekərəsli/ *adv*: بەڕەوشتانە، بە حەیاوە، بە مەندی) ◌ 1 بانزاکت، متین، شایسته 2 درخور

**decortication** *noun*

1 پێوەنەهێشتن یان لێکردنەوەی توێکڵ و... 2 لابردنی cortexی ئەندامێ (**decorticator** *n*) ◌ 1 پوست کندن 2 کورتیکاسیون

**decorum** /dɪ'kɔːrəm/ *noun*

1 ڕەوشت، ئەدەب، بەئابڕوویی، حەیا، شەرم، مەندی، ماقووڵی، لێوەشاوەیی، لێهاتوویی 2 بەڕێ‌وجێ‌بوون، گونجاوی، بەجێ‌بوون ◌ 1 نزاکت، متانت، شایستگی 2 تناسب

**decoupage** /ˌdeɪkuː'pɑːʒ, dɪ'kuːpɑːʒ, 'dɛkuːpɑːʒ/ *noun*

(فەرەنسی) دیکۆپاژ (= نەخشاندنی ئاستێ بە وردەکاغز) ◌ دکوپاژ

**decoy** /'diːkɔɪ/ *noun*

1 مەلی چێشکە یا ڕاو(ی) یا داو 2 داو، تەڵە، تەپکە ◌ 1 مرغ دام 2 تله

**decrease** /'diːkriːs/ *noun*

1 کەم‌بوونەوە، داشکان، دابەزین، نیشتنەوە، نزم‌بوونەوە 2 ڕێژە یان ڕادەی کەم‌بوونەوە (**decreasing** *adj*: کەمەوەبوو، نزمەوەبوو، ڕوولە کەمێ؛ **decreasingly** *adv*؛ دژەکەی increase) ◌ 1 کاهش 2 میزان کاهش

**decree** /dɪ'kriː/ *noun*

1 فەرمان، دەستوور، فەروار: *to issue/sign a decree* 2 *a presidential/royal decree* ◊ *decree* فەرمان 3 بڕیار (ی دادگا) 4 چارەنووس، قەدەر ◌ 1 فرمان، حکم 2 فتوا 3 حکم 4 تقدیر

**decree absolute** *noun, pl.* decrees absolute

جیابوونەوەی یەکجاری، بەردانی بە یەکجاری ◌ طلاق بائن

**decree nisi** /dɪˌkriː 'naɪsaɪ/ *noun, pl.* decrees nisi

(لە قانوونی وڵاتانی ڕۆژاوادا) جیابوونەوە یان تەڵاقی بەمەرج (بنەڕەت: *nisi* لاتین "unless") ◌ طلاق مشروط

**decreer** *noun*

فەرماندەرکەر، دەستووردەر، بڕیاردەرکەر ◌ حکم‌دهنده

**decrement** /'dɛkrɪm(ə)nt/ *noun*

کەم‌بوونەوە، داشکان، diminution ،reduction (**decremental** *adj*) ◌ کاهش، تنزل

**decrepit** /dɪ'krepɪt/ *adjective*

1 پیر، فەرتووت، زورهان، شندۆک، زەلیل، پەرپووت، ڕەندۆڵ، بەساڵاچوو 2 شڕ، کۆن، شەق‌وشڕ، چەپەرەشڕ، (خانووبەرە) ڕوولە کاول‌بوون، کاولە، ڕوولە رووخان ◌ 1 فرتوت، فرسوده 2 رو به ویرانی

**decrepitation** /dɪˌkrepə'teɪʃn/ *noun*

قرچ‌وهۆڕ ◌ ترق‌وتروق

**decrepitude** /dɪ'krepɪtjuːd, US -tuːd/ *noun*

1 پیری، کەڵەلایی، فەرتووتی، زورهانی، لارەملی، پەرپووتی، ڕەندۆڵی، بەساڵاچوویی: *the decline towards decrepitude and death* 2 شڕی، شکاوی، کۆنی، شەق‌وشڕی، لەکارچوویی، چەپەرەشڕی 3 کاولی، ویرانی، ڕووخاوی، داتەپیوی ◌ 1 کهولت، سالخوردگی 2 فرسودگی 3 ویرانی

**decrescendo** /ˌdiːkrɪ'ʃɛndəʊ/ = diminuendo

**decrescent** /dɪ'krɛs(ə)nt/ *adjective*

1 (مانگ) کەل، پەناگرتوو؟ 2 کەمەوەبوو ◌ 1 در حال افول 2 کاهش‌یابنده

**decretal** /dɪ'kriːt(ə)l/ *noun, adjective*

*n* دەستوور، فەروار، فەرمان (ب.ت. هی پاپ) *adj* فەرمانی، سەربە دەستوور، سەربە سروشتی فەرمان ◌ *n* فرمان، فتوا *adj* وابسته به فرمان

**decretive** *adjective*

فەرمانی، دەستووری، سەربە فەرمان ◌ وابسته به فرمان

**decretory** /'dekrɪtəʊrɪ/ *adjective*

فەرمانی، دەستووری، سەربە فەرمان، پێوەندی بە دەستوورەوە هەیە ◌ وابسته به فرمان

**decrial** /dɪ'kraɪəl/ *noun*

سووک‌کردن، ئابڕووبردن، زڕاندن، بەهیچ‌دانان، نیوزڕاندن، ترۆکردن ◌ بی‌ارج‌سازی، تقبیح

**decriminalization** /diːˌkrɪmɪnəlaɪ'zeɪʃn, US -lə'z-/ *noun*

تاوان‌نەهێشتن، تاوان‌سڕی ◌ جرم‌زدایی

**decrier** *noun*

سووک‌کەر، نرخ‌داشکێن، ڕووڕەشێنەر، داشکێنەر ◌ تقبیح‌کننده

**decuman** /'dekjʊmən/ *adjective*

گەورە، مەزن ◌ عظیم، سترگ

**decumbent** /dɪ'kʌmb(ə)nt/ *adjective*

(ڕووەک‌ناسی) ڕاکشاو، خەوێنراو، تەرزفڕێدەر (**decumbency** /dɪ'kʌmbənsɪ/ *n*: ڕاکشاوی، خەوێنراوی، تەرزفڕێدان) ◌ خوابیده

**decouple** /'dekjʊpl/ *adjective, noun*

دەبەرامبەر، دەئەوندە، دەچەندانە ◌ ده‌برابر

**decurion** /de'kjʊrɪən/ *noun*

1 سەردەستە، سەردە، سەرتیپ (دە سوار لە ڕۆمی کۆندا) 2 ئەندامی ئەنجومەنی پیرانی ڕۆمی کۆن Roman senate ◌ دی‌کوریون

**decurved** *adjective*
(زیندەناسی، ب.ت. دەنووکی باڵندە) شۆڕ، چەماوە بەرەو خوارێ ◇ خمیده به پایین

**decurrrent** /dɪˈkʌr(ə)nt/ *adjective*
(ڕووەکناسی) ژێرڕەو، خوارڕەو: ب.ت. گەڵاکانی لاسکداگر؛ (دارەکان) خاوەنی چەندین لقی (تا ئەندازەیەک) بەرامبەر (decurrence or decurrency *n*; decurrently /dɪˈkʌr(ə)ntli/ *adv*) ◇ دیکورنت

**decury** /ˈdekjʊrɪ/ *noun*
دەستەیەکی دەکەسە ◇ دستەی دەنفره

**decussate** /dɪˈkʌsət/ *adjective*
1 (ڕووەکناسی، گەڵاکان) ڕاست و چەپ، ڕێکخراو بەرامبەر بەیەک: *decussate leaves* 2 چەپوڕاستی ◇ دیکوست

**decussation** *noun*
چەپوڕاستی، یەکتربڕین بە شێوەی X ◇ تقاطع

**dedicated** /ˈdedɪkeɪtɪd/ *adjective*
1 دەربەست، پێبەند، خۆبەستە: *a dedicated teacher* 2 (کامپیوتەر) تایبەتی (dedicatedly *adv*) ◇ 1 متعهد 2 (کامپیوتر) اختصاصی

**dedication** /ˌdedɪˈkeɪʃn/ *noun*
1 پێشکەشکردن، پێدان، دیاری 2 پێشکەشنامە 3 لەخۆبوردوویی، خۆبەختکردن، تەرخان، تایبەتیدان ◇ 1 اهدا، تقدیم 2 اهدائیه 3 ایثار، وقف، اختصاص

**dedicatee** *noun*
پێپێشکەشکراو ◇ ددیکاتی

**dedicator** *noun*
1 پێشکەشکەر، دیاریپێدەر 2، تەرخاندەر، تایبەتیدەر ◇ 1 تقدیمکنندە 2 وقفکنندە، اختصاصدهنده

**deductibility** /dɪˌdjuːsəˈbɪlətɪ, US -ˌduːs-/ *noun*
1 لەداشکاندنهاتوویی، لەلێدەرکردنهاتوویی 2 بەخشراوی لە باج ◇ 1 قابلیت کسرکردن 2 معافیت از مالیات

**deducible** /dɪˈdjuːsəbl, US -ˈduːs-/ *adjective*
لەئەنجامگیریهاتوو، شیاوی بۆدەرکەوتن، دەردەکەوێ ◇ قابل استنتاج

**deductible** /dɪˈdʌktəbl/ *adjective*
1 لەداشکاندنهاتوو، شیاوی لێدەرکردن 2 تەرخان، بەخشراو لە باج (deductibility *n*) ◇ 1 کسرکردنی 2 معاف از مالیات

**deduction** /dɪˈdʌkʃn/ *noun*
1 ئەنجامگیری، بەڵگەهێنانەوە، بۆدەرکەوتن (لە گشتەوە بۆ کەم یان لە هۆوە بۆ هۆکرد)، ئەنجام، ئاکام 2 داشکاندن، (لێ)دەرکردن، لێدەرکاری، کەمکردنەوە، دابڕین، لێفڕێدان، (لێ)سووککردن: *deductions from your pay for tax, etc* 3 بڕی (لێ)داشکێنراو، فڕێدە: *tax deductions* ◇ 1 استنتاج، استدلال، نتیجه 2 کسر، تخفیف، کاهش 3 مقدار کسرشده

**deductive** /dɪˈdʌktɪv/ *adjective*
بەڵگەهێنانەوەیی، ئەنجامگیرییانە: *deductive logic/reasoning* (بڕوانە inductive) ◇ استدلالی، استنتاجی، قیاسی

**deductively** /dɪˈdʌktɪvli/ *adverb*
بە شێوەیەکی بەڵگەهێنانەوەیی یان ئەنجامگیرییانە ◇ به طور استدلالی

**deed** /diːd/ *noun*
1 کار، کردەوە، کردە، کردار: *a brave/charitable/evil/good deed*; *a tale of heroic deeds* 2 قەباڵە، تاپۆ: *the deeds of the house* ◇ 1 عمل، فعل، کردار 2 سند

**deed box** *noun*
مجری، سنووقی قەباڵەکان، سنووقی بەڵگەنامە ◇ صندوق اسناد

**deed of covenant** *noun*
پەیماننامە یان بەڵێنینامەی دانی خێروخێرات، ڕێکەوتننامەی پێدانی خێر: *Signing a deed of covenant makes £1 worth £1.33* ◇ تعهدنامەی پرداخت صدقه

**deed poll** *noun*
(بۆ گۆڕینی ناو) داخوازی فەرمی ◇ درخواست محضری

**deep** /diːp/ *adjective* (deeper, deepest), *adverb, noun*
*adj* 1 قووڵ، پێبڕ، کووێر، گاود، مەند یان مەنگ (ئاو): *a deep hole/well/river* 2 (خەو و هتد) قووڵ، گران، کڕخەو، شیرین: *a deep cut/wound* 3 (دەنگ) بۆڕ، گڕ: *a deep sleep/trance/coma* 4 (ڕەنگ) تۆخ، توند، تێر: *a deep roar/groan* 5 توند، بەڕشت، مجد: *a rich deep red*; *a deep economic recession*; *a place of great power and of deep significance* 6 دواوە، پشتەوە، نێوەوە 7 نوقمی، قووڵبووەوە، ناسەرسەرەکی، قووڵ: *to be deep in thought/conversation*; *The firm ended up deep in debt* 8 ئاڵۆز، سەخت، دژوار، ناسەرسەرەکی، تێگەیشتنسەخت، پێچەڵاوپێچ: *This discussion's getting too deep for me*
*adv* بە شێوەیەکی قووڵ، قووڵ، تا بنەوە، لە قووڵایی: *The miners were trapped deep underground*; *deep in the forest*
*n* دەریا، بەحر، جێگای قووڵ، گێژاو، قووڵایی، شینکایی: *His body was committed to the deep* (= he was buried at sea) ◇ 1 *adj* عمیق، ژرف 2 سنگین 3 (صدا) بم 4 (رنگ) سیر 5

شدید، جدی 6 عقب، تو 7 غرق در، غیرسطحی 8 پیچیده، غیرقابل فهم *adv* به طور عمیق، از ته *n* دریا، جای عمیق

**deep-breathing** *noun*
هەناسەی قووڵ ۞ نفس عمیق

**deep-chested** *adjective*
(دەنگ) بۆڕ، گڕ، ناخۆش ۞ ناهنجار، کلفت

**deep ecologist** *noun*
چالاک(وان)ی بواری دیپ ئیکۆلۆژی ۞ دیپ اکولوژیست

**deep ecology** *noun*
شێوەیێ لە چالاکی ژینگەناسی کە حەوڵی تەواوی لە پێناو پاراستنی گیانەوەران، گیا و رووەک و بەشەکانی تری ژینگە لە دەس‌تێوەردان و زیان‌پێگەیاندنی مرۆڤە ۞ دیپ اکولوژی

**deep-dish** *adjective*
(نافەرمی) تەواو، رەبەق، یەکجار، *deep-dish conservatism* :thoroughgoing ۞ کامل، فوق‌العاده

**deep-dyed** *adjective*
(نافەرمی) تەواو، رەبەق، thoroughgoing، complete ۞ کامل

**deep freeze** = freezer

**deep-frozen** *adjective*
بەستو، بەسەهۆڵبوو، جەڕدراو، جەڕەبابەدراو ۞ یخ‌زده

**deep-laid** *adjective*
1 نهێنی، نەهێنی، لەبنەوە، پەنامەکی 2 بە سەرنجەوە، ورد (پلان‌ڕێژکراو) ۞ 1 مخفیانه، محرمانه 2 دقیق

**deeply** /'di:pli/ *adverb*
بە توند، توند، قووڵ، بە شێوەیەکی قووڵ، لە (ناخ یان قوولایی) دڵەوە: *deeply rooted customs/ideas* ۞ به شدت، به طور عمیق، از ته دل

**deep-rooted** *adjective*, also deeply rooted
داکوتراو، بنج‌بەست، رەگ‌داکوتاو، ریشەدار، ناخ‌گیر، لەمێژینە، دێرین، ریشەداکوتاو، *a deep-rooted desire* :inveterate ۞ عمیق، ریشه‌دار

**deep-rootedness** *noun*
داکوتراوی، بنج‌بەستوویی، رەگ‌داکوتاوی، ریشەداری، ریشەداکوتاویی ۞ ریشه‌داری

**deeps** *noun, pl.*
قوولایی عەرز ۞ ژرفای زمین

**deep-sea** *adjective*
لە بەش یان شوێنە قووڵەکانی دەریا، لە نێزینە یان قوولاییەکانی دەریا، بە دوور لە کەنار: *a deep-sea diver* ۞ در قسمت‌های عمیق دریا

**deep-seated** *adjective*
داکوتراو، بنج‌بەست، رەگ‌داکوتاو، نەگۆڕ ۞ عمیق، ریشه‌دار

**deep-set** *adjective*
1 (چاو) بەقوولاچوو، داکەوتوو 2 داکوتراو، بنج‌بەست، رەگ‌داکوتاو، ریشەدار ۞ 1 (چشم) گود 2 ریشه‌دار

**the Deep South** *noun*
هەرێم یان ئەیالەتە باشوورییەکانی ئەمریکا (بریتین لە ئالاباما Alabama، جۆرجیا Georgia، لویزیانا Louisiana، میسیسیپی Mississippi، کارۆلینای باکووری North Carolina و کارۆلینای باشووری South Carolina) ۞ ایالات جنوبی امریکا

**deep space** *noun*, also outer space
قولایی (یەکانی) بۆشایی ئاسمان یان حەوا ۞ اعماق فضا

**deep structure** *noun*
(ڕێزمانی ترانسفۆرمەیشناڵ) بن‌پێکهات(ـە)، ژێربنیات، دیپ‌ستراکچێر (پێوەندی لۆژیکی بنەرەتی یان ژێرەوەی توخمەکانی دەستەوشە phrase یان رستەیێ، بروانە surface structure) ۞ ژرف‌ساخت

**deep vein thrombosis** *noun, abbreviation* DVT
دی‌ڤی‌تی (جۆرێ نەخۆشی سەختە کە خوێن دەمەیێ) ۞ دی‌وی‌تی

**deep-water zone** *noun*
ناوچەی قووڵی ئاو یان دەریا، قوولاییەکانی ئاو یان دەریا ۞ منطقه‌ی ژرف آب یا دریا

**deer** /dɪə(r), US dɪr/ *noun, pl.* same or deers
(گیانەوەرناسی) گاکێوی، ئاسک، ئافور، گاکێوییەکان [خێزان Cervidae: زۆر جۆرن] (red deer، stag نێرەئاسک، female deer، doe ئاسکەمێ) ۞ گوزن، گوزن‌ها

**deerfly** *noun, pl.* deerflies, also deer fly
مێشەئاسکانە، مێشەگاکێوی 1 (خوێن‌مژ و مشەخۆری ئاسک [*Lipoptena cervi*]) 2 جۆرێ مۆز یان مێشەکەرانە horsefly کە بە گوانداران زلەوە دەدا و دەبێتە هۆی راگوێستنی چەندین نەخۆشی [توخم *Chrysops*] ۞ مگس گوزن

**deergrass** *noun*
گیائاسک؟، جۆرێ sedgeی چکۆلە پێوەندی بە گیای cotton ـەوە هەیە [*Trichophorum cespitosum* (یان *Scirpus cespitosus*)] ۞ نوعی گیاه

**deerhound** /dɪə(r)haʊnd/ *noun*
سەگی راو، تانجی ۞ سگ شکاری

**deerlet** *noun*
گاکێوی چکۆلە، ئاسکی پچوک ۞ گوزن کوچک

**deer mouse** *noun*
(گیانەوەرناسی) جۆرێ مشکی شەوگەڕ، لە

ئـەمریکای بـاکووری و ناوەنـدی دەبینـرێ، مـشکەئاسک [Peromyscus maniculatus] و جۆرە پێوەندیدارەکان] ◌ نوعی موش

**deerskin** *noun*

کەوڵی ئاسک، چەرمی گاکێوی، پێستەی ئاسک ◌ پوست گوزن

**deerstalker** /ˈdɪəstɔːkə(r), US ˈdɪrs-/ *noun*

1 کـلاوی گـوێدار، سـەرگـوێدار، کـلاوی گوێداپۆش 2 راوچی ئاسک ◌ 1 کلاه گوشی 2 شکارچی گوزن

**deerstalking** *noun*

راوی ئاسک، راوەگاکێوی ◌ شکار گوزن

**deer tick** *noun*, also black-legged tick

گەنە(ی) گاکێوی یان ئافور، گەنەلاقڕەشە: هـی رۆژهـەڵاتی ولاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکـا و کەنەدا کە بەکتریایی رادەگوێزێ کە دەبێتـە هـۆی نەخۆشی Lyme [Ixodes scapularis syn. I. dammini] ◌ نوعی کنه

**de-escalation** *noun*

کـەمکردنـەوە (ی گـرژی)، داشـکاندن (رادەی تونـدی شـەڕ و هتـد؛ de-escalatory *adj*) ◌ بحران‌زدایی

**defacement** /diˈfeɪsmənt/ *noun*

تێکـدان، شـێواندن، شـێرزەکردن، سـڕینەوە، کوژاندنـەوە، رووشـاندن، چەواشـەکردن، ئابڕووبردن، ناحەزکردن ◌ مخدوش‌سازی

**de facto** /ˌdeɪ ˈfæktəʊ, US -toʊ/ *adjective, adverb*

*adj* دیفاکتۆ: *The general took de facto control of the country* ◊ *a de facto one-party system* *adv* لە راستیدا، بە کردەوە: *He continued to rule the country de facto* ◌ *adj* بالفعل *adv* عملاً

**defalcation** /ˌdiːfælˈkeɪʃən, US ˌdiːfɔːlˈkeɪʃən/ *noun*

دەس‌پیسـی، لـێدزی، هەڵـگرتن، لاخـستن (defalcator *n*) ◌ اختلاس

**defamation** /ˌdefəˈmeɪʃn/ *noun*

1 (مـاف) بوختـان، قـسەبۆهەڵبەستن، تۆمـەت، هەڵبەسـتە، ناوونـاتۆرە، قـسە 2 ئابـڕووبردن، نـەتک، سـووکـکـردن، ناوزڕانـدن، خراپـەوتن: 1 ◌ *The company sued for defamation* افترا، تهمت 2 آبروریزی، رسوایی

**defamatory** /dɪˈfæmətri, US -tɔːri/ *adjective*

سووکیپێکەر، ئابڕووبەرە، سووکانە، ناوزڕێن، رووڕەشکەر: *The article was highly defamatory* ◌ موهن، بدنام‌کننده

**default** /dɪˈfɔːlt, US ˈdiː-/ *noun*

1 (دادگا، پێشبڕکێ و هتد) نەچوونەوە، نەبوون، ئامادەنەبوون 2 (قەرز) نەدانەوە، پێنەدانەوە 3 کەمتەرخـەمی، جێبـەجێنـەکردن، درێغـی 4 نەبوون 5 (کامپیوتێر) پێشهەڵبژاردە، دیفۆڵت ◌ 1 عدم حضور 2 عدم پرداخت، نکول 3 عدم ایفا 4 فقدان 5 (کامپیوتر) پیش‌فرض

**defaulter** *noun*

1 (دادگا) لایـەنی نـەهاتوو یـان ئامادەنـەبوو 2 (پێشبڕکێ) نـەیاری نـەهاتوو یـان ئامادەنەبوو 3 قەرزنەدەرەوە، نەدەرەوە 4 کەمتەرخەم، خەتابار، گوناهبار 5 سەربازی خـەتابار یان گوناهبـار ◌ 1 طرف غایب 2 حریف غایب 3 نکول‌کننده 4 قصورکننده 5 سرباز خاطی

**defeasance** /dɪˈfiːz(ə)ns/ *noun*

هەڵوەشاندنەوە، بەتاڵکردنەوە، پووچکردنەوە ◌ الغا، ابطال

**defeasibility** /dɪˌfiːzɪˈbɪləti/ *noun*

لەهەڵوەشانەوەهاتوویی ◌ الغاپذیری

**defeasible** /dɪˈfiːzɪb(ə)l/ *adjective*

لەهەڵوەشـانەوەهاتوو، هەڵدەوەشـێتەوە، پـووچ دەکرێتەوە ◌ الغاپذیر

**defeat** /dɪˈfiːt/ *noun*

تێشکان، شکان، شکست، تڕۆقە، تێکشکان، بەزین، بۆڕ، دانان، دۆڕانـدن: *The party faces defeat in the election* ◌ شکست، باخت

**defeated** *adjective*

تـێشـکاو، شکـستخـواردوو، بـەزیو، بـۆڕ، دۆڕاندوو، داناو ◌ شکست‌خورده، بازنده

**defeatism** /dɪˈfiːtɪzəm/ *noun*

دانپیانـان بـە تێـشکانا، ناهومێـدی، دڵـساری، دڵناخۆشی، رەشبینی ◌ اعتراف بـه شکـست، یأس، ناامیدی، بدبینی

**defeatist** /dɪˈfiːtɪst/ *noun, adjective*

*n* مرۆی ناهومێد، دڵسارد، دڵناخۆش، بەزۆک *adj* رەشبـین، خراپـەبین: *a defeatist attitude/view* ◌ *n* آدم مأیوس *adj* بدبین

**defeature** *noun*

تێشکان، شکان، تێکشکان، بەزین ◌ شکست

**defecation** /ˌdefəˈkeɪʃn, US ˌdiː-/ *noun*, also defaecation

1 پیـسایی‌کـردن، ریـان، دەس‌بەئاوگەیانـدن، دانیشتن، خۆخاوێن‌کردنەوە، خۆخاڵی‌کردن 2 پالاوتن، پارزنین ◌ 1 تخلیه 2 تصفیه

**defect** /ˈdiːfekt, US dɪˈfekt/ *noun*

کـەمی، گرفـت، کێـشە، گیروگرفـت، گـیر، کـەموکـوڕی، ناتـەواوی، نـاپوختی، ناپوختـەیی، کـەموکـورتی، عـەیب، خـەوش، ئـیراد، shortcoming: *a defect in the glass* ◊ *a speech defect* ◊ *a hearing defect* ◌ نقص، عیب

**defection** /dɪˈfekʃn/ *noun*

1 گەڕانـەوە، هەڵـگەڕانەوە، وازهێنـان، دەس‌هەڵـگرتن، چـۆڵکـردن، بـەجێهێـشتن،

بادانەوە 2 پەیمان‌شکێنی، بێ‌بەڵێنی 3 پەنابەرێتی 4 ڕاکـردن، هـەڵاتن، چوونـەنێو دوژمنـەوە 5 نەبوون، کەمی، کەم‌وکووڕی، ناتەواوی ⬡ 1 برگشت، ارتداد، ترک، روگردانی 2 نقض عهد 3 پناهندگی 4 فرار 5 فقدان، نارسایی

**defective** /dɪˈfektɪv/ *adjective, noun*
*adj* ناتـەواو، نادروسـت، نیـوەچڵ، ناپوختـە، خراپ، عەیب‌دار، سەقەت، خەوش‌دار، بەگرفت، کێشەبەدوا *n* 1 مرۆڤی ناتـەواو یـان ناپوخـت، کەسـێکی وا 3 کـاری ناتـەواو ⬡ *adj* معیـوب، ناقص *n* 1 آدم ناقص 2 فعل ناقص

**defectively** /dɪˈfektɪvli/ *adverb*
ناتەواوانە، بە شێوەیەکی عـەیب‌دار ⬡ بـە طـور ناقص

**defectiveness** /dɪˈfektɪvnəs/ *noun*
ناتەواوی، ناتەواوبوون، عەیب‌داربوون ⬡ معیوب بودن

**defector** *noun*
1 پەنابـەر، پەناخواز 2 هـەڵاتوو ⬡ 1 پناهنـده 2 فراری

**defence** /dɪˈfens/ *noun, adjective,* US defense
*n* 1 بەرگری، بەربەسـتی، بەرەڤانی، بەرگـەگری، خـۆڕاگری، لەسـەرخۆکردنەوە، پـشتیوانی 2 کەرەسـەی بـەرگری 3 پـارێزەر، ئەولـەکار، بەرەڤان‌کار 4 بیانوو، پەڵپ، بەهانە 5 (وەرزش) بەرگری، هێڵی بەرگری، یاریزانی هێڵی بـەرگری *adj* بەرگری‌یانە ⬡ *n* 1 دفاع، حمایت 2 وسیلەی دفاع 3 وکیل مـدافع 4 عـذر 5 دفـاع، خـط دفـاع، بازیکن خط دفاع *adj* دفاعی

**defenceless** /dɪˈfensləs/ *adjective,* US defenseless
بێچارە، دەس‌پێ‌نەکراوە، بێ‌گوناهـ بێ‌بـەرگری، بـێ‌پـەنا، گونـاح، بـێ‌دەسـەڵات: *defenceless children* (defencelessness *n*) ⬡ بی‌دفاع

**defence mechanism** *noun,* also defence reaction
میکـانیزمی بـەرگری، کاردانـەوەی بـەرگری ⬡ ساز و کار دفاعی

**defendant** /dɪˈfendənt/ *adjective*
1 تاوانبـارکراو، گوناهبـارکراو، گومـان‌لێ‌کـراو 2 شکات‌لێ‌کراو، پاشمار، سکاڵالێ‌کراو ⬡ 1 متهم 2 مدعی‌علیه

**defender** /dɪˈfendə(r)/ *noun*
1 بـەرگری‌کـەر، بـەر(گـە)گـر 2 پـارێزەر، بەرەڤـان‌کـار 3 لایـەنگر، داژدار، پـشتیوان: *a passionate defender* ⬡ 1 دفاع‌کننده 2 مـدافع 3 حامی، طرفدار

**defenestration** *noun*
فڕێدان یان خستنەدەرەوە لە پەنجێرەوە ⬡ پرت کردن از پنجره

**defense** = US spelling of defence

**defensibility** /dɪˌfensəˈbɪləti/ *noun*
لەبـەرگری‌هـاتوویی، بـەرگری‌لـێ‌کـراوی ⬡ دفاع‌پذیری

**defensible** /dɪˈfensəbl/ *adjective*
1 لەبەرگری‌هاتوو، دەپارێزرێ، بەرگری‌لێ‌کراو 2 (تیۆری و هتـد) لەپاسـاوهاتوو، پاساو دەدرێ، بەرگری لێ‌دەکرێ ⬡ 1 دفاع‌پذیر 2 توجیه‌پذیر

**defensibly** /dɪˈfensəbli/ *adverb*
لەبەرگری‌هاتووانە ⬡ به طور دفاع‌پذیر

**defensive** /dɪˈfensɪv/ *adjective, noun*
*adj* بەرگری‌یانە، خۆپارێزەرانە، بەربەستی‌یانە، پارێزەرانـــە: *defensive fortifications* *n* بـەرگری، پاراسـتن، هـەڵومـەرجی بـەرگری، بـارودۆخی بـەرگری، راسـان ⬡ *adj* دفـاعی، تدافعی *n* دفاع، حالت دفاعی

**defensively** /dɪˈfensɪvli/ *adverb*
راساوانە، بە حاڵەتی بەرگری‌یەوە ⬡ بـا حالـت دفاعی

**defensiveness** /dɪˈfensɪvnəs/ *noun*
هـەڵومـەرجی بـەرگری، بـارودۆخی بـەرگری، راسـان ⬡ حالت دفاعی

**defensor** *noun*
پارێزەر، بەرەڤان‌کار، ئاوکات ⬡ وکیل مدافع

**deference** /ˈdefərəns/ *noun*
ڕێزلێنان، حورمەت، ڕێز، ڕوومەت، بەقسەکردن، لەبەرچاوگرتن، دڵڕاگرتن: *The women wore veils in deference to the customs of the country* ⬡ احترام، حرمت، مراعات

**deferent** /ˈdefərənt/ *adjective*
ڕێزدانـەر، حورمـەت‌دانـەر، لەبـەرچاوگر ⬡ احترام‌گذار

**deferential** /ˌdefəˈrenʃl/ *adjective*
1 بەڕەوشـت، بەئـەدەب 2 ڕێزدانەرانـە ⬡ 1 مؤدب 2 حرمت‌گذارانه

**deferentially** /-ʃəli/ *adverb*
بەڕەوشتانە، بەئەدەبانە ⬡ مؤدبانه

**deferment** *noun,* also deferral /dɪˈfɜːrəl/
بەدواخـستن، ڕاگرتن، پاش‌خـستن، خـستنەدواوە ⬡ تعویق، تأخیر

**deferrable** *adjective*
شیاوی دواخستن، دوادەخرێ، پاش‌دەخرێ ⬡ قابل تعویق

**deferred** *adjective*
پاش‌خراو، بەدواخراو ⬡ عقب‌افتاده

**deferred shares** *noun, pl.*
بەش یان شارە دواخراوەکان ⬡ سهام مؤخر

**defercescence** /ˌdɪfəˈvɛs(ə)ns/ *noun*
1 کەم‌بوونەوە یان نیشتنەوەی تـا، فێنک‌بوونـەوە 2 کەم‌بوونەوەی کوڵ‌وهوڕ یان کوڵ‌وخرۆش ⬡ 1 فرونشستن تب 2 کاهش جوش و خروش

**defiance** /dɪ'faɪəns/ *noun*
1 سەربزێوی، ملبادان، بەقسەنەکردن، سەرچەوتی، سەرپێچی، بێ ئەمری، نافەرمانی، یاخیگەری: *an act/a gesture of defiance* 2 بەرەنگاری، دژایەتی، بەرهەڵستی، لەڕووداوێستان 3 گوێ پێنەدان، کەمتەرخەمی ◌ 1 تمرد، نافرمانی 2 اعتراض، مخالفت، به مبارزەطلبی 3 بی‌اعتنایی

**defiant** /dɪ'faɪənt/ *adjective*
1 سەربزێو، ملبادەر، لەقسەدەرچوو، بێ ئەمر، سەرچەوت، نافەرمان، یاخی: ◊ *defiant rebels* 2 ڕووهەڵماڵراو، بەگژداچوو، ڕوودار، ڕووشە، ڕوودارانە: *a defiant refusal* ◌ 1 متمرد، نافرمان 2 جسور، گستاخ، گستاخانه

**defiantly** /dɪ'faɪəntli/ *adverb*
ڕوودارانە، بە ڕووشەیی ◌ گستاخانه

**deficiency** /dɪ'fɪʃnsi/ *noun, pl.* deficiencies
1 کەمی، ناتەواوی، کەموکووڕی، نیوەچڵی، عەیب، خەوش: *a deficiency of Vitamin B* 2 کەمی ◌ 1 کمبود، نقص، کاستی 2 کسری

**deficiency disease** *noun*
نەخۆشی کەمی (یان ناتەواوی) ڤیتامین ◌ بیماری کمبود ویتامین

**deficient** /dɪ'fɪʃnt/ *adjective*
کەم، بەشنەکردوو، ناتەواو، نیوەچڵ، :defective ◊ *a diet that is deficient in vitamin A* ◊ *deficient in judgment* ◊ *deficient strength* ◊ *Deaf people are sometimes treated as being mentally deficient* ( deficiently /dɪ'fɪʃntli/ *adv*) ◌ ناکافی، کم، نارسا، ناقص

**deficit** /'defɪsɪt/ *noun*
1 کەمی، ناتەواوی، کوورتهێنان، بەشنەکردوویی: *2 a budget/trade deficit* کەمی، کیماسی ◌ 1 کسری، کمبود 2 نقصان

**deficit spending** *noun*
کەمی دراونامە یان بودجە ◌ کسر بودجه

**defied** = past of defy

**defier** *noun*
بەربەرچدەرەوە، بەرهەڵست(ی کردوو)، بەربەرەکانی کردوو، لەڕووداوێستاو،: *a defier of convention* ◌ مخالفت‌کننده، مبارزه‌طلب

**defilade** /ˌdefɪ'leɪd/ *noun*
(میلیتاری) پەنەکاری پارێزەرانە یان بەرگری‌یانە ◌ استحکامات تدافعی

**defile** /dɪ'faɪl, US 'di:faɪl *noun*
1 گەروو، تەنگ، تەنگەلان، باریکەلان، دەربەند، دەرتەنگ 2 ڕێگا یان دەربەندی ڕیزڕەو، ڕیزەڕێ (سەرباز) ◌ 1 تنگه، گردنه 2 راه ستون‌رو

**defilement** *noun*
1 گلاوکردن، پیس‌کردن 2 پیسی، گلاوی، ناپاکی، ناخاوێنی ◌ 1 نجس‌سازی 2 آلودگی

**definable** /dɪ'faɪnəbl/ *adjective*
لەپێناسەهاتوو، دەناسێنرێ، (بەوردی) لێکدەدرێتەوە ◌ تعریف‌پذیر

**defined** *adjective*
دیار، لەبەرچاو، خویا، ئاشکرا، ڕوون ◌ مشخص، واضح

**definite** /'defɪnət/ *adjective*
1 ئاشکرا، دیار، بەرچاو، دیاری‌کراو 2 مسۆگەر، یەکلایی‌بەوەبوو، بێ ئەملاوئەولا، بێ چەندوچوون، سوور، گومان‌لێنەکراو، بێ ئەملاوئەولا، دڵنیا، :decided ,unquestionable *demanded a definite answer* (definiteness *n*) ◌ 1 مشخص، معین 2 قطعی، مسلم، مطمئن

**definite article** *noun*
(ڕێزمان) ئامرازی ناساندن یان دەرخەر (وەکوو وشەی the لە ئینگلیسیدا، «ال» لە عەرەبی و «ەکە» لە کوردیدا) ◌ حرف معرفه

**definitely** /'defɪnətli/ *adverb*
بە شێوەیەکی مسۆگەر، بێ ئەملاوئەولا، بێ گومان، حەتمەن، بە دڵنیایی‌یەوە، (لە وەڵامدانەوە) بەڵێ، بێ ئەملاوئەولا، ئەی چۆن: *I definitely remember sending the letter* ◌ به طور قطعی، مسلماً، البته

**definition** /ˌdefɪ'nɪʃn/ *noun*
1 پێناسە، ناساندن، پێناسین، لێکدانەوە(ی بەوردی)، باس‌کردن 2 دیاری‌کردن، دەس‌نیشان‌کردن، سنووردانان 3 ئاشکرایی، دیاربوون 4 (دەنگ، ڕوونـاکی و هتد) ڕوونی، شەفی، زوڵاڵی، سافی ◌ 1 تعریف، وصف، شرح 2 تعیین 3 صراحت 4 وضوح

**definitive** /dɪ'fɪnətɪv/ *adjective, noun*
*adj* 1 یەکلایی‌بەوەبوو، مسۆگەر، بڕاوە، گومان‌لێنەکراو، بێ ئەملاوئەولا، کۆتایی‌پێهاتوو، بێ چەندوچوون: *a definitive agreement/answer* 2 (پوول) گشتی، ناتایبەتی *n* پوولی (پۆست) ناتایبەتی یان گشتی ◌ *adj* 1 قطعی، مسلم 2 عمومی، همگانی *n* تمبر پست همگانی

**definitively** /dɪ'fɪnətɪvli/ *adverb*
بە شێوەیێکی مسۆگەر، بێ ئەملاوئەولا، بێ گومان، بێ‌شک ◌ به طور قطعی

**deflagration** /ˌdeflə'greɪʃn/ *noun*
سووتان، ئاورگرتن، ئاگرتێ‌بەربوون، شەوەتین ◌ احتراق

**deflated** *adjective*
دڵسارد، بەخۆداشکاو، تریقەوەبوو، خەجاڵەتبار، خەجاڵەتەوەبوو، فشەوەبوو ◌ سرخورده

**deflation** /ˌdi:'fleɪʃn/ *noun*
1 فش، فش‌کردنەوە، فس‌بوونەوە، پووچاندنەوە، فسان، بابەتاڵ‌کردن، با(لێ)دەرکردن، باگیری،

خالی‌کردنی یا 2 (ئابووری) چوونەیەک یان گرژبوونی دراوی (کەم‌بوونەوەی بڕی پارەی ئابووری ولاتێ، بە شێوەیێ کە نرخەکان بێنەخوارێ یان بەرز نەبنەوە) 3 (زەوی‌ناسی) لابرانی پارچۆلکەکانی بەرد، لم و هتد بەهۆی باوە، بامال ◌ 1 تخلیە‌ی باد 2 کاهش ضرب‌آهنگ اقتصاد 3 دفلاسیون

**deflationary** /ˌdiːˈfleɪʃənri, US -neri/ *adjective*

مایەی چوونەیەک یان گرژبوونی دراوی، دژی هەلاوسان: *deflationary policies* ◌ موجب کاهش ضرب‌آهنگ اقتصاد

**deflationary policy** *noun*

سیاسەت یان رامیاری دژی هەلاوسان ◌ سیاست انقباضی

**deflection** /dɪˈflekʃn/ *noun,* also deflexion

1 لادان، کلا(بوون)، کلایی، لاری، خواری: *the the -tion of the missile ◊ angle of -lection* 2 (رووناکی) شکانەوە *away from its target* ◌ 1 انحراف، کجی 2 (نور) شکست، انکسار

**deflective** /dɪˈflektɪv/ *adjective*

لارکەرەوە، خوارکەر(ەوە) ◌ کج‌کننده

**deflexed** *adjective*

بۆ خواری یان پشتەوە چەماوەتەوە، خواروەوەشکێن، پشتەوەشکێن ◌ خمیده بە سوی پایین یا پشت

**deflorate** *adjective*

بێ‌پژاو، بێ‌پرژاو ◌ بکارت از دست‌داده

**defloration** /ˌdiːflɔːˈreɪʃ(ə)n/ *noun*

بێ‌پژان، کچێنی‌نەمان، بێ‌پرژان ◌ ازاله‌ی بکارت

**defogger** *noun*

تەم‌ڕەوێن ◌ مه‌زدا

**defoliant** /ˌdiːˈfəʊliənt, US -ˈfoʊ-/ *noun*

مەتریال یان مادەی گەلاوەرێن (لە شەڕدا) ◌ ماده‌ی برگ‌زدا

**defoliation** /ˌdiːˌfəʊliˈeɪʃn, US -ˌfoʊ-/ *noun*

گەلالێ‌کردنەوە، پێوەنەهێشتنی گەلا ◌ برگ‌زدایی

**defoliation** /ˌdiːˌfəʊliˈeɪʃn, US -ˌfoʊ-/ *noun*

گەلالێ‌کەرەوە، گەلاوەرێن، گەلاسڕەوە، گەلاپێوەنەهێل ◌ برگ‌زدا

**deforestation** /ˌdiːˌfɒrɪˈsteɪʃn, US -ˌfɔːr-, -ˌfɑːr-/ *noun*

نەهێشتنی دارستان، لەنێوبردن یان تیابردنی دارستان، تەخت‌کردنی دارستان، بڕین و سووتاندنی دارستان ◌ تخریب جنگل، جنگل‌زدایی

**deformation** /ˌdiːfɔːˈmeɪʃn, US -fɔːrˈm-/ *noun*

1 لادان، لاری، نارێکی، خواری، گەراوی، گێری 2 شێواندن، تێکدان، گۆڕین، نارێک‌کردن 3 گۆڕانی شێوە یان روالەت 4 نوقسانی، سەقەتی ◌ 1 انحراف، کجی 2 تحریف 3 تغییر شکل 4 نقص عضو

**deformed** /dɪˈfɔːmd, US -ˈfɔːrmd/ *adjective*

لار، خوار، گێر، شێواو، ناحەز، تێکچوو، نارێک، گۆڕاو، نوقسان، سەقەت، عەیب‌دار ◌ از شکل‌افتاده، معیوب

**deformity** /dɪˈfɔːməti, US -ˈfɔːrm-/ *noun, pl.* deformites

تێکچوویی، گۆڕاوی، ناحەزی، نوقسانی، سەقەتی، لادان، لاری، نارێکی، خواری، گێری ◌ از شکل‌افتادگی، نقص، انحراف، کجی

**DEFRA** /ˈdefrə/ *abbreviation* Department for Environment, Food and Rural Affairs

(لە بریتانیا) دیفری، دیفرا (= دیپارتمانی ژینگە، خۆراک و کاروباری لادێیی) ◌ دفرا

**defragmentation** *noun*

(کامپیوتێر) نەهێشتنی پەرش‌وبڵاوی، پەرشی‌ڕەوێنی، کەم‌کردنەوەی پەرشی ◌ دفراگمنتاسیون

**defrauder** *noun*

لەخشتەبەر، فریودەر، لەچنگ‌دەرهێنەر (پارە) ◌ فریب‌دهنده

**defrayable** *adjective*

شیاوی دان، لەپێدان‌هاتوو، دەیدرێتێ، پێی‌دەدرێ ◌ قابل پرداخت

**defrayal** /dɪˈfreɪəl/ *noun,* also defrayment /dɪˈfremənt/

دان، پێدان ◌ پرداخت

**defroster** *noun*

سەهۆڵ‌کەرەوە، تەم‌ڕەوێن، شووشەگەرم‌داهێن (هی ماشێن) ◌ گرم‌کن شیشه

**deft** /deft/ *adjective*

شارەزا، وەستا، لێزان، دەس‌ڕەنگین: *deft hands/fingers/footwork* ) deftly /deftli/ *adv*: شارەزایانە، وەستایانە؛ ) ◌ ماهر، زبردست، ورزیده

**deftness** /deftnəs/ *noun*

شارەزایی، وەستایی، لێزانی، دەس‌ڕەنگینی ◌ مهارت، زبردستی

**defunct** /dɪˈfʌŋkt/ *adjective*

1 خوالێ‌خۆش‌بوو، مردوو 2 کۆن، لەکارکەوتوو، ناکاریگەر، بێ‌بڕەو، لەباوکەوتوو: *a largely defunct railway network* 3 رووڵە نەمان، رووڵە تیاچوون ◌ 1 مرحوم، متوفی 2 قدیمی 3 رو بە زوال

**deg** *abbreviation* degree

**dégagé** /deɪˈgɑːʒeɪ, US -ˈgaʒeɪ/ *adjective*

بێ خەم، کەمتەرخەم، بێ‌دەربەست، نادەربەست، ئازاد، unconcerned ،nonchalant ◌ بی‌توجه،

بی‌مانع

**degausser** *noun*
مەگناتیس‌لێ‌لابەر یا پەڕێن (هی نەویستراو یان زیادی) ◊ مغناطیس‌زدا

**degeneracy** /dɪˈdʒenərəsi/ *noun, pl.* degeneracies
1 خراپ‌بوون، شپرزەبوون، داوەشان، دافەوتان، فاقدان، داڕزان، لەنێوچوون، لێک‌بوونەوە، لێک‌هەڵوەشان 2 لادانی سێکسی، بێ‌سەروبەرەیی، 2 sexual perversion نشوستی، داخزان، لێژبوونەوە، داشکان، داچوون، لێ‌کەوتن، دابەزین، ئاکارنزمی: *The movie is full of scenes of crime and degeneracy* ◊ 1 تباهی، فساد 2 انحراف جنسی 3 انحطاط، انحطاط اخلاقی

**degenerate** /dɪˈdʒenərət, US dɪˈdʒenerət/ *adjective, noun*
*adj* 1 خراپ، شپرزە، داوەشاو، دافەوتاو، داڕزاو، لێکەوەبوو، لێک‌هەڵوەشاو 2 روولە داشکان، روولە خراپ‌بوون، روولە داچوون *n* مرۆی خراپ، پیس ◊ *adj* 1 منحط، فاسد 2 رو بە انحطاط *n* آدم فاسد

**degeneration** /dɪˌdʒenəˈreɪʃn/ *noun*
1 خراپ‌بوون، داوەشان، دافەوتان، داڕزان، دافەتران، لێک‌بوونەوە، لێک‌هەڵوەشان: *Intensive farming in the area has caused severe degeneration of the land* 2 داخزان، داشکان، نشوستی، سووکی، داچوون، لێ‌کەوتن، دابەزین، ئاکارنزمی، بیرنزمی، بیرداوەشاوی: *social/moral degeneration* ◊ 1 فساد، تباهی 2 انحطاط، انحطاط فکری یا اخلاقی

**degenerative** /dɪˈdʒenərətɪv/ *adjective*
روولە خراپ‌تر، لێ‌پیس‌ترکردوو ◊ وخیم‌ترشونده

**deglutition** /ˌdiːgluːˈtɪʃ(ə)n/ *noun*
(تکنیکی) قوت‌دان، هەڵلووشین، ئاوقەکردن، هەڵمەقوت(کردن)، خستنەگەروو (deglutitive *adj*) ◊ بلع

**degradation** /ˌdegrəˈdeɪʃn/ *noun*
1 سووکایەتی، سووکی، نزمی، چروکی، دابەزین، داکەوتن، لێ‌کەوتن، داشکان 2 لێک‌هەڵوەشان، لێک‌بوونەوە 3 خراپ‌بوون، داوەشان، دافەوتان، داڕزان، داخزان، داشکان، داچوون 4 (زەوی‌ناسی) داخوران ◊ 1 تحقیر، خواری، تنزل 2 تجزیه 3 تباهی، فساد، انحطاط 4 فروسایی

**degraded** *adjective*
خراپ، داوەشاو، داڕزاو، دافەوتاو ◊ منحط، فاسد

**degrading** /dɪˈgreɪdɪŋ/ *adjective*
سووک، سووکانە، سووکی‌پێ‌کەر، ئابڕووبەرە: *Many people agree that pornography is degrading to women* ◊ تحقیرآمیز

**degree** /dɪˈgriː/ *noun*
1 پلە (بە نیشانەی °) 2 ڕێژە، رادە، دانگ، ئەندازە، ئاقەند، ئاست، دۆخ، پەرەسە 3 پلەوپایە، پایە، پۆست 4 (کۆن) بایەخ یان پێگەی کۆمەلایەتی 5 بڕوانامە (ی زانکۆیی) 6 (موسیقا)، پلە 7 (ڕێزمان) پلە ◊ 1 درجە 2 میزان، حد، مقدار 3 رتبە 4 جایگاه اجتماعی 5 مدرک 6 و 7 درجە

**degree of dissociation** *noun*
پلە یا رادەی لێک‌هەڵوەشان ◊ درجەی تفکیک

**degree of freedom** *noun*
(تکنیکی) پلە یا رادەی ئازادی ◊ درجەی آزادی

**degression** /dɪˈgreʃen/ *noun*
کەم‌بوونەوەی رادەی باج ◊ کاهش میزان مالیات

**degressive** /dɪˈgresɪv/ *adjective*
کەم‌بوونەوەیی (لە رادەی باج‌دا) ◊ کاهشی

**degu** /ˈdeɪguː/ *noun*
جۆری کرتێنەری مشک‌ئاسای ئەمریکای باشووری، تووک‌هەوریشمی درێژ [تۆخم Octodon] ◊ دیگو

**degustation** /ˌdiːgəsˈteɪʃən/ *noun*
چێشتن، مەزەکردن ◊ مزەگیری

**de haut en bas** /də ˌəʊt ɒ̃ ˈbɑː, French də ot ɑ̃ ba/ *noun*
لە سەری خوارەوە ◊ از بالا تا پایین

**dehiscence** *noun*
پشکوتن، کرانەوە، گوڵ‌کردن، دەم‌کردنەوە، زارکردنەوە، سەرهێنانەدەر، دەمەترەک‌بوون، ترەکین، داقلیشان، داتلیشان، قەڵەش‌بردن، لەت‌بوون: *pollen freed by dehiscence of the anther* ◊ شکفتگی، ترکیدگی

**dehiscent** *adjective*
پشکوتوو، کراوە، گوڵ‌کردوو، دەم‌وەکردوو، ترەکی، داقلیشاو، داتلیشاو، قەڵەش‌بردوو، لەت‌بوو ◊ شکفته، ترکیده

**dehortation** /ˌdiːhɔːˈteɪʃn/ *noun*
نەهێشتن، بەرگرتن، رێ‌لێ‌گرتن، پێشگیری ◊ منع، بازداشت

**dehortative** /diːˈhɔːtətɪv/ *adjective*
ڕێگر، بەرگر، پێشگیر، گێڕەوە، پەشیمان‌کەرەوە ◊ بازدارنده

**dehumanization** /ˌdiːˌhjuːmənaɪˈzeɪʃn, US -nəˈz-/ *noun*
لەمرۆڤایەتی‌خستن، لەپیاوەتی‌خستن ◊ انسانیت‌زدایی

**dehumanized** *adjective*
نامرۆڤانە، میکانیکی، دەزگایی، کلیشەیی، ماشێنی ◊ غیرانسانی، مکانیکی

**dehumanizing** *adjective*
لەمرۆڤایەتی‌خەر، لەپیاوەتی‌خەر ◊ انسانیت‌زدا

**dehumidification** *noun*
شێ‌بڕی، شێ‌لێ‌لابردن، وشک‌کردنەوە (هەوا یان

گاز) ◌ رطوبت‌زدایی

**dehumidifier** *noun*
شێ‌بڕ، شێ‌لێ‌لابەر، وشک‌کەرەوە ◌ رطوبت‌زدا

**dehydrated** /ˌdiːhaɪˈdreɪtɪd/ *adjective*
1 (خۆراک و هتد) وشکەوەکراو، وشکێنراو 2 (لەش) ئاولێ‌چنراو 3 (کیمیا) وشکەوەکراو، ئاولێ‌چنراو، ئاو(لێ)دەرهێنراو ◌ 1 خشکانده 2 آب از دست‌داده 3 (شیمی) آب‌زدایی‌شده

**dehydration** /ˌdiːhaɪˈdreɪʃn/ *noun*
1 وشک‌کردنەوە، ئاولێ‌گرتن، ئاودەرهێنان، ئاولێ‌چنین، ئاولێ‌لابردن 3 (لەش) ئاولێ‌چنران ◌ 1 آب‌زدایی 2 از دست رفتن آب بدن

**dehydrator** *noun*
وشک‌کەرەوە، ئاولێچن، ئاوچن ◌ آب‌زدا

**dehydrochlorination** *noun*
(زیندەکیمیا) رەوتی لابردنی هایدرۆژین و کلۆرین یان کلۆرایدی هایدرۆژین لە(سەر) ئاوێتەیێ ◌ دیهیدروکلروریناسیون

**dehydrocholestrol**
/diːˌhʌɪdrə(ʊ)kəˈlɛstərɒl/ *noun*
(زیندەکیمیا) ئاوێتەیێکی نێو پێست کە لە لایەن رووناکی ژووربنەوشەوە دەبێتە cholecalciferol (vitamin $D_3$) ◌ دیهیدروکلسترول

**dehydrogenase** /ˌdiːhʌɪˈdrɒdʒəneɪz/ *noun*
(زیندەکیمیا) دیهایدرۆژیناز: هەوێنەیێ enzyme کە دەبێتە هۆی لاچوونی گەردیلەکانی ئۆکسیژین لە(سەر) گەردێ molecule، هەوێنەیێ کە دەبێتە هۆی تاودانی راگوێستن یان لاچوونی ئۆکسیژین لە تەنێکەوە بۆ تەنێکی تر ◌ دیهیدروژناز

**dehydrogenation** *noun*
ئۆکسیژین‌لێ‌لابردن (گەردیلە یان گەردیلەکانی)، لابردنی ئۆکسیژین لە ئاوێتەیێکی کیمیایی‌یەوە ◌ اکسیژن‌زدایی

**de-icer** /ˌdiː ˈaɪsə(r)/ *noun*
سەهۆڵ‌لابەر (ب.ت. لە فڕۆکەیێ) ◌ یخ‌زدا

**deicide** /ˈdeɪɪsʌɪd, US ˈdiːɪ-/ *noun*
1 خوداکوژ 2 خوداکوژی، خودافەوتێنی ◌ 1 خداکش 2 خداکشی

**deictic** /ˈdeɪktɪk, US ˈdʌɪktɪk/ *noun, adjective*
(زمانەوانی) *n* ناوی ئاماژە، ناوی نیشانە *adj* ئاماژەیی، نیشانەیی (وەک *next week* ،*here* ،*you* ،*me*) ◌ *n* اسم اشاره *adj* اشاری

**deification** /ˌdeɪɪfɪˈkeɪʃn, US ˌdiːɪfɪˈkeɪʃn/ *noun*
بەخودادانان، بەخوداکردن: *the deification of medieval kings* ◌ خداانگاری، تألیه

**deiform** /ˈdoːəfɔːm/ *adjective*
خودایانە، خودائاسا، شێوەخودا ◌ خداگونه، خداوار

**deindustrialization** *noun*
کەم‌بوونەوەی چالاکی پیشەسازی ناوچە یا ئابووریێ ◌ صنعت‌زدایی

**deinonychus** /dʌɪˈnɒnɪkəs/ *noun*
چنگ‌ناحەزە؟، دایناسۆریکی dromaeosaurid نێوەراستی قۆناخی کرێتاسە، درێژی‌یان تا 3.3 یا 1 ] لێ دەگەیشت [یۆنانی: "terrible" *deinos* + "claw" *onux*, *onukh-*] ◌ دینونیکوس

**deionization** *noun*
ئایۆن‌لێ‌لابردن، ئایۆن‌گ(ێ)ری ◌ یون‌زدایی

**deionizer** *noun*
ئایۆن‌لێ‌لابەر، ئایۆن‌گ(ێ)ر ◌ یون‌زدا

**deism** /ˈdeɪɪzəm, US ˈdiːɪz-/ *noun*
خوداپەرستیی بەبێ باوەڕ بە پێغەمبەران و بابەتەکانی تری ئایین و هتد، خوداباوەڕیی سروشتی ◌ خداگرایی عقلانی

**deist** /ˈdeɪɪst, US ˈdiːɪst/ *noun*
خوداباوەڕی ئەقلانی ◌ خداگرای عقلانی

**deistic** *adjective*, also deistical (deistically *adj*)
سەربە خوداباوەڕی ئەقلانی ◌ وابسته به خداگرای عقلانی

**deity** /ˈdeɪəti, US ˈdiːəti/ *noun*, *pl.* deities
1 خودایی، خوایەتی، خودایەتی، خودا 2 خێو، خودا، خوا: *Greek/Roman/Hindu deities* 3 خواژن 4 (Deity) خودا، خوداوەند، کردگار ◌ 1 الوهیت، ربانیت، خدا 2 اله 3 الهه 4 (Deity) خداوند

**deixis** /ˈdeɪksɪs, US ˈdʌɪksɪs/ *noun*
(زمانەوانی) جێناو یان برێناوە ئامازەیی‌یەکان (بنەڕەت: لە *deiknunai* یۆنانی "نیشان‌دان") ◌ ضمایر اشاره

**déjà vu** /ˌdeɪʒɑː ˈvuː/ *noun*
(فەڕەنسی) بەناسیاوزانی (هەستێ کە ئەوەی ئێستا روویداوە، هەر ئەو شتەیە کە لەوەپێش بووە): *I had a strong sense of -jà vu as I entered the room* ◌ آشناپنداری

**dejecta** /dɪˈdʒektə/ *noun*
پیسایی، گوو، feces ،excrement ◌ مدفوع

**dejected** /dɪˈdʒektɪd/ *adjective*
1 خەمبار، نارەحەت، دەستەوئەژنۆ، کز، مات، ماتەمین، دلپڕ، کۆلیل، دڵتەنگ، مەلوول، خەفەتبار، لێوبەبار 2 ناهومێد، بێ‌هیوا، دلسارد ◌ 1 غم‌زده، افسرده 2 مأیوس

**dejectedly** /dɪˈdʒektɪdli/ *adverb*
خەمبارانە، بە نارەحەتی‌یەوە، بە خەم و پەژارەوە: *He stared dejectedly at his feet* ◌ به طور غم‌زده

**dejection** /dɪˈdʒekʃn/ *noun*
1 خەمباری، نارەحەتی، دەستەوئەژنۆیی، کزی، ماتەمینی، ماتی، دڵتەنگی 2 خەفەت، خەم، کۆقان، پەژارە، ماتەم 3 ناهومێدی، بێ‌هیوایی،

دلساردی ◌ 1 افسردگی، غم‌زدگی 2 اندوه 3 یأس

**de jure** /ˌdeɪ ˈdʒʊəri, US ˈdʒʊri/ *adjective, adverb*

*adj* (لاتین) راست، دروست، قانوونی، بەرحەق، ڕەوا *adv* بەپێی قانوون: *de jure segregation* ◌ *adj* قانونی *adv* مطابق قانون

**dekaliter** = decalitre

**dekameter** = decametre

**dekko** /ˈdekəʊ, US -koʊ/ *noun,* have a dekko at

(تافەرمی) چاو لێ‌کردن لە، چاوپیاخشاندن بە: ◌ *Let's have a dekko at your new car* نگاه انداختن به

**Del.** *abbreviation* Delaware

**delation** /dɪˈleɪʃn/ *noun*

1 تاوانبارکردن، گومانبارکردن، گوناهبارکردن 2 دانەپاڵ 3 بڵاوکردنەوە ◌ 1 اتهام 2 اسناد 3 انتشار

**delator** *noun*

گوناهبارکەر، قسەدواخەر، بوختانباز ◌ اتهام‌زننده

**Delaware** /ˈdɛləwɛː/ *noun, pl.* same or Delawares

1 دیلاواری: ئەندامی گەلێکی سوورپێست، جاران دانیشتووی دۆڵی رووباری دیلاواری نیوجێرسی و رۆژهەڵاتی پێنسیلڤانیا بوون 2 هەرکام لە دوو زمانی نەماوی ئالگۆنکویایی ◌ Algonquian دلاواری

**Delawarean** /dɛləˈwɛːrɪən/ *adjective, noun*

دیلاوارایی *adj* سەربە دیلاواری *n* دانیشتووی رەسەنی دیلاواری ◌ دلاواریایی

**delay** /dɪˈleɪ/ *noun*

1 درەنگی، راوەستان، (بە)جێمان، بەدرەنگ‌کەوتن، دیرکردن، دیرکرد، دواکەوتن، پاش‌کەوتن، خلافان، دریژە، بەند(بوون)، ساوەساوکردن؟، وەخت لەدەس‌چوون، ماوەی درەنگ‌کردن: *get ◊ a delay of 30 minutes* 2 راوێستان *started without delay* ◌ 1 تأخیر، زمان تأخیر 2 معطلی

**delayed** *adjective*

راگیراو، بەدرەنگ‌کەوتوو، دیرکردوو، دواکەوتوو، گیرۆ ◌ با تأخیر

**delayed-action** *noun*

(بۆمب) سەعاتی ◌ ساعتی

**delayed-action bomb** *noun*

بۆمبی سەعاتی ◌ بمب ساعتی

**dele** /ˈdiːli/ *noun*

(نیشانە) لابرێ، بسڕێتەوە، بیسڕنەوە، لایبەن، لاچێ، لاخرێ ◌ حذف شود، بردارید

**delectable** /dɪˈlektəbl/ *adjective*

1 خۆش، بەتام، بەلەزەت: *a delectable meal* 2 (خوازە) جوان، ژیکەڵە، رند، لەدڵ‌چەقیو ◌ 1 مطبوع 2 (مجازی) جذاب، خوشگل

**delectably** /dɪˈlektəbli/ *adverb*

بە شێوەیەکی خۆش، خۆش ◌ با لذت

**delectation** /ˌdiːlekˈteɪʃn/ *noun*

خۆشی، وەشی، لەزەت، شادی، رابواردن، delight ◌ لذت، تفریح

**delegacy** /ˈdelɪgəsi/ *noun, pl.* delegacies

1 نوێنەرایەتی 2 لێژنە یان دەستەی نوێنەران، committee یان board ،delegation ◌ 1 نمایندگی 2 هیأت نمایندگان

**delegate** /ˈdelɪgət/ *noun*

1 نوێنەر: *The conference was attended by* 2 ئەندامی لێژنە *delegates from 56 countries* یان دەستەیێ ◌ 1 نماینده 2 عضو هیأتی

**delegation** /ˌdelɪˈgeɪʃn/ *noun*

1 نوێنەرایەتی 2 شاند، نێردە، دەستەی نوێنەران 3 پێ‌سپاردن، راگوێستن (دەسەلات و...): *delegation of authority/decision-making* ◌ 1 نمایندگی 2 هیأت نمایندگی 3 واگذاری

**deleterious** /ˌdeləˈtɪəriəs, US -ˈtɪr-/ *adjective*

خراپ، بەزیان، بەزەرەر، بەوەی، بەئازار، بەزەر: *the deleterious effect of stress on health* (deleteriously *adv*: بە شێوەیەکی خراپ) ◌ مضر

**deletion** /dɪˈliːʃn/ *noun*

لابردن، سڕینەوە، قرتاندن، پەڕاندن، شۆردنەوە، دەرهاویشتن، کوژاندنەوە، هەشف(اندن): *He made several deletions to the manuscript* ◌ حذف

**deli** /ˈdeli/ *pl.* delis. *abbreviation* delicatessen

**Delian** /ˈdiːlɪən/ *adjective, noun*

*adj* سەربە Delos، دوورگەیێ لە دەریای ئیژە (لە سەردەمانی کلاسیک بۆ Apollo پیرۆز بووە) *n* خەڵکی دیلۆس، دیلۆسی ◌ دلوسی

**deliberate** /dɪˈlɪbərət/ *adjective*

1 بەئانقەست، ئاگادارانە، لەرووی مەبەستەوە، بەمەبەست، intentional ،planned: *a deliberate act of ◊ deliberate decision* 2 *The speech was a deliberate ◊ vandalism attempt to embarrass the government* 3 هەڵسەنگێنراو، لێکەوەدراو، بێ‌پەلە(پەل) لەسەرەخۆ، مەند، هێدی، هێمن: *She spoke in a slow and deliberate way* (deliberateness /dɪˈlɪbərətnəs/ *n*) ◌ 1 عمدی 2 سنجیده 3 متین

**deliberately** /dɪˈlɪbərətli/ *adverb*

1 بە ئانقەست، (بە) دانستە، لە رووی زانینەوە، ئاگادارانە: *She's been -ely ignoring him all day* 2 بە لەسەرەخۆیی ◌ 1 تعمداً 2 با متانت

**deliberation** /dɪˌlɪbəˈreɪʃn/ *noun*
1 قووڵبوونەوە، تێ‌ڕامان، (لێ)وردبوونەوە، تێ‌فکرین، بیرلێ‌کردنەوە، تێبینی، هەڵسەنگاندن، لێکدانەوە، لێکۆڵینەوەی ورد 2 پرس‌وڕا، ڕاوێژ 3 لەسەردووان، ڕاگۆڕینەوە، دان‌وستان 4 لەسەرەخۆیی، هێمنی، مەندی، ئەهۆنی، ئارامی: *She signed her name with great deliberation* 5 (بە)جێمان (deliberations) (ڕەوتی) دان‌وستانەکان): *The deliberations of the committee are completely confidential* (deliberator *n*) ◌ 1 تعمق، غور و بررسی 2 مشورت 3 بحث، مذاکره 4 متانت 5 (در جمع، جریان) مذاکرات

**deliberative** /dɪˈlɪbərətɪv/ *adjective*
ڕاوێژکاریانە: *a deliberative assembly* (-iberatively /dɪˈlɪbərətɪvli/ /dɪˈlɪbərətɪvli/ *adv* ؛deliberativeness *n*) ◌ مشورتی

**delicacy** /ˈdelɪkəsi/ *noun, pl.* delicacies
1 ناسکی، نەرمی، نیانی، نازداری، جوانی 2 هەستیاری، تیژی 3 وردبوونەوە، خوردبوونەوە، سەرنجپێدان 4 ڕەوشت، ئەدەب 5 ئارامی، مەندی، نیانی، لەسەرەخۆیی 6 خۆشی، لەززەت، مەزە، شتی خۆش، چێشتی خۆش ◌ 1 ظرافت، لطافت 2 حساسیت 3 دقت 4 نزاکت 5 ملایمت 6 لذت، چیز لذیذ، غذای لذیذ

**delicate** /ˈdelɪkət/ *adjective*
1 ناسک، نەرم، نازدار، نیان، جوان 2 هەستیار، تیژ 3 بەڕەوشت، بەئەدەب 4 قرپ، قرچ، تورت، زووشکاو 5 ورد، باریک 6 لاواز، کز، بێ‌هێز، ناسک 7 (ڕەنگ) کەمڕەنگ، ڕۆشن، گەش 8 نیان، ئارام، مەند، نەرم، هێدی، ئەهۆن 9 خۆش، بەمەزە، بەلەزەت ◌ 1 ظریف، لطیف 2 حساس، تیز 3 بانزاکت 4 شکننده 5 دقیق 6 ضعیف 7 کم‌رنگ 8 ملایم 9 لذیذ

**delicately** /ˈdelɪkətli/ *adverb*
بە نەرمی، بە نیانی، بە شێوەیەکی ناسک: *-ately balanced flavours* ◌ با ظرافت، بە لطافت

**delicateness** /ˈdelɪkətnəs/ *noun*
1 ناسکی، نەرمی، نیانی، نازداری، جوانی، باریکی 2 وردبوونەوە، خوردبوونەوە، سەرنجپێدان ◌ 1 لطافت، ظرافت 2 دقت

**delicatessen** /ˌdelɪkəˈtesn/ *noun*
دووکانی فرۆشتنی خواردەمەنی چاک، خواردەمەنی‌فرۆشی چاک ◌ فروشگاه مواد غذایی لوکس

**delicious** /dɪˈlɪʃəs/ *adjective*
1 بەتام، بەلەزەت، خۆش: *a delicious alternative to cheese* 2 (شۆخی) خۆش 3 جوان، ژیکەڵە، دڵڕفێن، ڕند، سەرنجڕاکێش، لەدڵچەقیو ◌ 1 مطبوع، لذیذ، لذت‌بخش 2 (شوخی) بامزه 3 زیبا، جذاب

**deliciously** /dɪˈlɪʃəsli/ *adverb*
بە شێوەیەکی خۆش، بەلەزەتانە ◌ بە طور مطبوع

**deliciousness** /dɪˈlɪʃəsnəs/ *noun*
بەلەزەتی، بەتامی، خۆشی، بەمەزەیی ◌ خوش‌مزگی، لذت‌بخشی

**delict** /dɪˈlɪkt, US ˈdiːlɪkt/ *noun*
(ماف) تاوان، گوناهـ ◌ جرم، خلاف

**delight** /dɪˈlaɪt/ *noun*
1 شادی، خۆشی، گەشی، سەرخۆشی، خۆشحاڵی، دڵشادی، دڵخۆشی، بەکەیفی، کەیف‌خۆشی: *a feeling of sheer/pure delight* 2 دڵخۆشکەرە، مایەی خۆشحاڵی ◌ 1 شادمانی، شعف 2 موجب شادمانی

**delighted** /dɪˈlaɪtɪd/ *adjective*
شاد، خۆش، سەرخۆش، گەش، خۆشحاڵ، دڵشاد، دڵخۆش، بەکەیف: *a delighted smile* ◌ خوشحال، بانشاط

**delightedly** /dɪˈlaɪtɪdli/ *adverb*
بە خۆشحاڵی، بە گەشی(یەوە) ◌ با شادی

**delightful** /dɪˈlaɪtfl/ *adjective*
1 خۆش، بەلەزەت 2 شاد، جوان، ڕند، خۆشیک، سەرنجڕاکێش، ژیکەڵە: *a delightful child* ◌ 1 لذت‌بخش، مطبوع 2 قشنگ

**delightfully** /dɪˈlaɪtfəli/ *adverb*
بە شێوەیەکی خۆش ◌ بە طور لذت‌بخش

**Delilah** *noun*
(ئینجیل) گراوی سامسۆن Samson (لە کتێبی Judges دا) ◌ دلیله

**delimitation** /diːˌlɪmɪˈteɪʃn/ *noun*
سنووردانان، دیاریکردنی سنوور، ڕادەدانان، بەستنەوە، دەس‌نیشان‌کردن ◌ تحدید یا تعیین حدود

**delineation** /dɪˌlɪniˈeɪʃn/ *noun*
1 دیاریکردن، دەس‌نیشان‌کردن 2 ناساندن، باس‌کردن، ڕوون‌کردنەوە 3 دارشتن، کێشانەوە، هێڵکاری ◌ 1 تعیین 2 تعریف، توصیف 3 ترسیم

**delineator** *noun*
کێشەرەوە، هێڵکار ◌ طراح، رسام

**delinquency** /dɪˈlɪŋkwənsi/ *noun, pl.* delinquencies
1 خراپەکاری، خراپە، سووچ: *an increase in juvenile delinquency* 2 کەمتەرخەمی، کەمکاری، درێخی 3 نەدانەوەی قەرزی دواکەوتوو ◌ 1 بزهکاری، بزه 2 قصور 3 عدم پرداخت بدهی عقب‌افتاده

**delinquent** /dɪˈlɪŋkwənt/ *adjective, noun*
*adj* 1 خراپەکار، خەتابار، خەتاکار، سووچبار، گوناهبار 2 (قەرز و هتد) بەدواکەوتوو، درەنگ‌کردوو، بەدواخراو *n* لاوی خراپەکار ◌ *adj* 1 بزهکار، خاطی 2 (بدهی و...) معوقه *n* نوجوان بزهکار

**deliquescence** /ˌdelɪˈkwesns/ *noun*
1 (کیمیا) شێ‌مژی، شێ‌هەڵمژی(ن) 2 توانەوە، شلەوەبوون، شلبوونەوە، تلیسانەوە ◌ 1 نم‌گیری، نم‌پذیری 2 گداز‌ش

**deliquescent** /ˌdelɪˈkwesnt/ *adjective*
1 (کیمیا) شێ‌مژ، شێ‌گر، شێ‌هەڵمژ 2 تواوە، شلەوەبوو، تلیساو 3 خووساو لەبەر ئارەق ◌ 1 نم‌گیر، نم‌پذیر 2 گدازنده 3 خیس عرق

**delirious** /dɪˈlɪriəs, US -ˈlɪəriəs/ *adjective*
1 وڕێنەکەر، وڕێنەبێژ، هاتەرانوپاتەرانکەر، تووشی وڕێنەهاتوو 2 (خوازە) شاگەشکە، وڕووژاو، هەژیو ◌ 1 هذیانی، دچار هذیان 2 (مجازی) هیجان‌زده

**deliriously** *adverb*
شاگەشکانە، بە شێوەیەکی وڕووژاو ◌ به طور هیجان‌زده

**delirium** /dɪˈlɪriəm, US -ˈlɪəriəm/ *noun*
1 وڕێنە، گلتە، راوان، لافە، هەوڕاوە، قسەبەیەکادان، هاتەرانوپاتەران: *He mumbled in delirium all night* 2 شێتی 3 شاگەشکەیی، وڕووژان، هەژان، هەڵچوون ◌ 1 هذیان 2 دیوانگی 3 هیجان، شوریدگی

**delirium tremens** /dɪˌlɪriəm ˈtriːmenz, US -ˌlɪəriəm/ *noun, abbreviation* DTs
وڕێنەی ئەلکوڵی (وڕێنە و لەرزین کە لەبەر خواردنەوەی ئەلکوڵیکی یەکجارەوە دێتەپێشێ) ◌ نوعی آشفتگی روانی

**deliverable** /dɪˈlɪvərəbl/ *adjective*
دەگەیێنرێ، پێی‌دەدرێ، دەگا بەدەستێ ◌ قابل تحویل

**deliverance** /dɪˈlɪvərəns/ *noun*
1 رزگاری، بەربوون، ئازادبوون، نەجاتبوون، رەهابوون، دەربازبوون 2 وتەی فەرمی ◌ 1 رهایی، نجات 2 سخن رسمی

**deliverer** *noun*
1 گەیێنەر، گەیەنەر، هێنەر، پێدەر، بەدەستەوەدەر 2 وتاردەر، قسەکەر، بێژەر 3 رزگارکەر، نەجاتدەر، رەهاچی، ئازادکەر، بەردەر ◌ 1 رساننده، تحویل‌دهنده 2 سخنران 3 نجات‌بخش

**delivery** /dɪˈlɪvəri/ *noun, pl.* deliveries
1 گەیاندن، هێنان، پێدان، دان، دانەدەس، بەدەستەوەدان، بەدەستەوەدانی نامە و بوخچەی پۆستێ 2 (وتار و...) کردن، وتن، دەربڕین، شێوەی دەربڕین، راوێژ: *an easy/difficult delivery* 3 منداڵبوون 4 رزگاری، ئازادی، نەجات 5 بەدەستەوەدان 6 خستن، هاویشتن، هەڵدان (ب.ت. تۆپی کریکێت): *a fast delivery* 7 شێوازی هاویشتن ◌ 1 تحویل 2 ایراد، طرز بیان 3 وضع حمل 4 نجات 5 تسلیم 6 پرتاب 7 طرز پرتاب

**delivery book** *noun*
دەفتەری پێدان (یا بەدەستەوەدان) ◌ دفتر تحویل

**deliveryman** *noun, pl.* deliverymen
کاربەدەستی پێدان (یان بەدەستەوەدانی شتەکان) ◌ مأمور تحویل

**delivery note** *noun*
پسوولە یا نامەی وەرگرتنی کەلوپەل، ڕیسیتی وەرگرتنی شتەکان ◌ رسید دریافت کالا

**delivery van** *noun,* also delivery truck
ڤانی دانی کەلوپەل، ڤانی پێدان یان بەدەستەوەدانی شتومەک ◌ وانت تحویل

**dell** /del/ *noun*
(وێژەیی) دۆڵ، شیو، دەرە (چکۆلە و ب.ت. سەوزەڵانی و پڕد) ◌ دره

**delocalization** *noun*
لابردن لە شوێنێکی تایبەتی ◌ دلوکالیزاسیون

**Delphic** /ˈdelfɪk/ *adjective,* also Delphian /-fɪən/
1 سەربە پەرسگەی دێلفی Delphi (لە یۆنان) 2 (زۆرتر delphic) تێگەیشتن‌سەخت، گران، رازاوی، پڕنهێنی، سەرەندەرلێ‌نەکراو، فرەمانا ◌ 1 وابسته به دلفی 2 مرموز

**delphinium** /delˈfɪniəm/ *noun, pl.* delphiniums
(رووەکناسی) گوڵەئاڵوز [تەوخم *Delphinium*] ◌ زبان در قفا

**Delphinus** *noun,* from Greek *delphin-, delphis*
1 دێلفینۆس: کۆئەستێرەی باکووری هەڵکەوتوو لە رۆژاوای Pegasus (بە واتای dolphin) 2 دەستەیێ لە گواندارانی دەریایی ◌ دلفینوس

**delta** /ˈdeltə/ *noun*
1 دێلتا، یەکاو، سێ‌سووچکە (چوارەمین پیتی ئەلفوبێی یۆنانی Δ، δ) 2 (رووبار) سێ‌سووچکە 3 (Delta) وشەکۆدی پێوەندی‌یە رادیۆیی‌یەکان بۆ پیتی d یان D 4 – delta wave ◌ 1 دلتا 2 (رودخانه) دلتا 3 دلتا

**deltaic** *adjective*
سێ‌سووچکەیی، دێلتایی، سەربە دێلتا، یەکاوئاسا ◌ وابسته به دلتا

**delta rays** *noun, pl.*
تیشک سێ‌سووچکە یا دێلتاکان ◌ اشعه‌های دلتا

**delta-v** = acceleration

**delta wave** *noun,* also delta or delta rhythm
شەپۆلی دێلتا ◌ موج دلتا

**delta wing** *noun*
باڵ‌سێ‌سووچکەیی، باڵی سێ‌سووچکەیی (فڕۆکە) ◌ بال دلتایی

**delta wing aircraft** *noun*
فڕۆکەی باڵ‌سێ‌سووچکەیی ◌ هواپیمای بال‌مثلثی

**delta-winged** *adjective*
باڵ‌سێ‌سووچکەیی ◌ بال‌مثلثی

**deltiologist** /ˌdeltɪˈɒlədʒɪst/ *noun*
کەسێ کە کارتی پۆستاڵ بۆ سەرقاڵی کۆدەکاتەوە ◯ دلتیولوژیست

**deltiology** *noun*
کۆکردنەوەی کارتی پۆستاڵ، تەتەڵەوەچنی؟ ◯ دلتیولوژی

**deltoid** /ˈdeltɔɪd/ *adjective, noun*
*adj* سێ سووچکە(ئاسا)، دیلتائاسا، شێوەسێ‌سووچکە، یەکاوئاسا: *n a deltoid leaf* ماسوولکەی سێ‌سووچکەیی ◯ *adj* دلتامانند *n* ماهیچەی دلتامانند

**deluder** *noun*
تەفرەدەر، هەڵخەڵەتێنەر، بەهەڵەدابەر ◯ اغفال‌گر

**deluge** /ˈdeljuːdʒ/ *noun*
1 (توند) سێلاو، لافاو، لێمشت، لەهی، بارانی بەخوڕەم، باران و لەنگێزە، بارانی قورس، شەستەباران 2 (خوازە) ڕێژنە، لێشاو، لافاو، لوزە: *received a deluge of offers* ◯ 1 سیل، باران سیل‌آسا 2 (مجازی) رگبار

**delusion** /dɪˈluːʒn/ *noun*
1 خەیال، بیروبۆچوونی فشە و قۆڕ، ورێنە، خەیاڵبردنەوە، خەیاڵی خاو یان پڕوپووچ، دڵخۆشی لەخۆڕایی 2 هەڵفریواندن، لەڕێ‌دەرکردن، ڕێ‌ پێ هەڵەکردن، بەهەڵەدابردن، لەخشتەبردن، فریودان (*delusionary adj*) ◯ 1 وهم، توهم، پندار، توهم‌زدگی 2 اغفال

**delusional** *adjective*
خەیاڵی، پڕوپووچ، درۆ، فشە ◯ موهوم، وهمی

**delusions** *noun, pl.*
خەیاڵ یان خەیاڵاتی پڕوپووچ ◯ اوهام

**delusions of grandeur** *noun*
خۆبەزل‌زانی خەیاڵی، خۆبەگەورەزانی خەیاڵی، ورێنەی خۆ پێ زلەیی، خەیاڵی خۆبەگەورەزانی ◯ هذیان عظمت

**delusive** /dɪˈluːsɪv/ *adjective*, also delusory /dɪˈluːsəri, -zəri/
1 خەیاڵی، درۆ، ناڕاستەقینە، پڕوپووچ، بێ‌بنچینە: *delusive promises* 2 فریودەر، هەڵفریوێنەر، خەڵەتێنەر، لەخشتەبەر، ڕێ‌ پێ هەڵەکەر، لەڕێ‌دەرکەر (*delusiveness n*) ◯ 1 موهوم، واهی، بی‌اساس 2 فریبنده

**delusively** /dɪˈluːsɪvli/ *adverb*
بە شێوەیەکی خەیاڵی، بە درۆ ◯ به طور موهوم

**de luxe** /ˌdə ˈlʌks, US ˈlʊks/ *adjective*
دولوکس، چاک، هەرەباش، هەرەچاک، گرانبایی، luxury: *a de luxe hotel* ◊ *The de luxe edition is bound in leather* ◊ *a de luxe edition* ◯ دولوکس

**delver** *noun*
لێکۆڵەر، پشکێنەر ◯ بررسی‌کننده

**Dem.** *abbreviation* 1 Democrat 2 Democratic
1 (لە ئەمریکا) دیموکرات 2 (لە ئەمریکا) دیموکراتیک

**demagnetizable** *adjective*
بۆ ئەوە دەبێ تایبەتمەندی مەگناتیکی لێ لابرێ یان نەهێڵرێ، شیاوی لابردن یان نەهێشتنی تایبەتمەندی مەگناتیکی ◯ قابل مغناطیس‌زدایی

**demagnetization** *noun*
نەهێشتن یان لابردنی تایبەتمەندی مەگناتیکی (شتێ) ◯ مغناطیس‌زدایی

**demagnetizer** *noun*
لابەری تایبەتمەندی مەگناتیکی، دیمەگناتیزێر ◯ مغناطیس‌زدا

**demagogic** /ˌdeməˈgɒgɪk, US -ˈgɑːg-/ *adjective*, also demagogical
خەڵک‌فریودەرانە، خەڵک‌فریودەر (demagogically *adv*) ◯ عوام‌فریبانه، عوام‌فریب

**demagogism** /deməgɒgɪzəm/ *noun*
خەڵک‌فریودان، خەڵک‌هەڵفریودان، خەڵک‌هاندان ◯ عوام‌فریبی

**demagogue** /ˈdeməgɒg, US -gɑːg/ *noun*
1 خەڵک‌فریودەر، خەڵک‌هاندەر، ئاژاوەگێڕ 2 (لە یۆنان و ڕۆمی کۆندا) وتاردەرێ کە پشتیوانی هۆزێکی خەڵکی ئاسایی دەکرد، ڕێبەرێکی خەڵک (ی ڕەمەکی) سەردەمانی زوو ◯ 1 عوام‌فریب 2 دماگوگ

**demagoguery** /-ˈgɒg(ə)ri/ *noun*, also demagogism or demagoguism
ڕێباز و شێوە و کردەوەکانی demagogue ◯ دماگوگری

**demagogy** /ˈdeməgɒgi, US -gɑːgi/ *noun*, also demagoguery
خەڵک‌فریودان، خەڵک‌هەڵفریودان، خەڵک‌هاندان، ئاژاوەگێری، ئاژاوەچێتی ◯ عوام‌فریبی

**demand** /dɪˈmɑːnd, US dɪˈmænd/ *noun*
1 داخوازی، داوا، بڕەو 2 (ئابووری) داخوازی، داوا 3 حەوجێ، پێویستی 4 داخوازی پێدان (demand note) 5 (خوازە) بار، قورسایی ◯ 1 درخواست 2 (اقتصاد) تقاضا 3 نیاز 4 درخواست پرداخت 5 (مجازی) فشار

**demand bill** *noun*
بەرات یان بیلی داخوازی یان داواکردن ◯ برات دیداری

**demanding** /dɪˈmɑːndɪŋ, US -ˈmæn-/ *adjective*
1 سەخت، گران، دژوار، چەتوون، پڕئەرک، پڕزەحمەت: *a demanding job* 2 پڕچاوەڕوانی (*demandingly adv*) ◯ 1 شاق، طاقت‌فرسا 2 پرتوقع

**demand note** *noun*
داخوازی پێدان، داوای پێدان ◯ درخواست پرداخت

**demarcation** /ˌdi:mɑ:ˈkeɪʃn, US -mɑ:rˈk-/ *noun*, also demarkation

1 سنوور، تخوب 2 دیاریکردنی سنوور، دەسنیشانکردنی سنوور، نیشانەکردن 3 جوودایی، جیابوونەوە، جیاکردنەوە، جیاوازیدانان (بنەڕەت: لە *demarcación* سپانیایی) ۞ 1 مرز 2 تعیین حدود 3 افتراق

**demarcator** *noun*

دیاریکەری سنوور، سنووربردەر، دەسنیشانکەری سنوور ۞ تعیین‌کنندەی حدود

**demarche** /deɪˈmɑ:ʃ/ *noun*

(فەرەنسی) ڕێوشوێن، ڕیباز، هەنگاو یان کردەوەی سیاسی (فەرەنسی، لە *démarcher* "هەڵێنانی هەنگاوەکان") ۞ مشی، اقدام سیاسی

**demarkation** = demarcation

**demassification** *noun*

هەڵوەشاندن یا پارچەپارچەکردن بۆ بەشە پێکهێنەرەکان ۞ دمسیفیکاسیون

**deme** /di:m/ *noun*

1 بەش، جۆرێ دابەشاندنی سیاسی یۆنانی کۆن و ئێستا 2 (زیندەناسی) گەلە: subdivision لە کۆمەڵی گیانەوەر و ڕووەکی پێکەوەپێوەندیدار (بنەڕەت: لە *dēmos* یۆنانییەوە "گەل" "people") ۞ دیم

**demeaning** /dɪˈmi:nɪŋ/ *adjective*

سووک، سووکایەتیپێکەر ۞ تحقیرآمیز

**demeanour** /dɪˈmi:nə(r)/ *noun*, US demeanor

هەڵسوکەوت، جووڵانەوە، ڕەوتار، ڕەفتار، شێوەی جووڵانەوە، شێوەی ڕەفتار ۞ رفتار، طرز رفتار

**demented** /dɪˈmentɪd/ *adjective*

1 شێت، دەلوو، دین 2 تووشبوو بە خەرەفاوی یان شێتی، خەرەفاو ۞ 1 دیوانه 2 مبتلا به زوال عقل

**dementedly** /dɪˈmentɪdli/ *adverb*

شێتانە ۞ دیوانەوار

**démenti** /deɪˈmɔ̃ti/ *noun*

بەدرۆخستنەوە یان نکۆڵی فەرمی وتەیێکی بڵاوەبوو ۞ دمنتی

**dementia** /dɪˈmenʃə/ *noun*

(پزشکی) خەرەفاوی، جوڕیاوی، شێتی، تێکچوونی ئەقڵ (demential *adj*) ۞ زوال عقل، اختلال مشاعر، جنون

**dementia praecox** = schizophrenia

**demerara** *noun*, also demerara sugar /ˌdeməreərə ˈʃʊɡə(r), US -rerə/

شەکری سوور، شەکرەسووره (جۆرێ خاوی دروشت، هی ڕووبار یان ناوچەی Demerara لە گوویانا Guyana) ۞ شکر سرخ

**demerit** /di:ˈmerɪt/ *noun*

1 خاڵی لاوازی، عەیب، گرفت، کەموکووڕی، کێشە، ناتەواوی 2 لێنەهاتوویی، لێنەوەشاوەیی، بێمایەیی 3 (لە خوێندنگا لەبەر خراپ جووڵانەوە) نمرەی خراپ یان تەمێیی (demeritorious /-ˈtɔ:rɪəs/ *adj*) ۞ 1 نقطه ضعف، نقص 2 بی‌کفایتی، نمره‌ی منفی

**demersal** /dɪˈmɜ:s(ə)l/ *adjective*

(ماسی) دەژی نزیک بە تەرکی دەریا ۞ دمرسال

**demesne** /dəˈmeɪn/ *noun*

1 (کۆن) ناوچە، دەڤەر 2 دنیا، جیهان، جەهان 3 (ماف) خاوەنداری دارایی ڕاستەقینە 4 زەویزاری تایبەتی، مڵکی خۆ ۞ 1 منطقه 2 جهان 3 دمین 4 ملک شخصی

**Demeter** *noun*, Latin, from Greek *Dēmētēr*

دیمیتر: خواژنی کشتوکاڵ، لە میتۆلۆژی یۆنانیدا، بڕوانە Ceres ۞ دمتر

**demi-** /ˈdemi/

پێشوند: نیمچە، نیوە، لا، کەمتر لە: *demigod* (بنەڕەت: لە ڕێگای *demisemiquaver* فەرەنسی لە *dimedius* لاتینی سەدەکانی نیوەڕاست "نیو"، لە *dimidius* سەرەتاتر) ۞ پیشوند: نیم، کم‌تر از

**demigod** /ˈdemigɒd, US -gɑ:d/ *noun*

نیمچەخودا، لاخودا، نیوەخودا ۞ نیمه‌خدا

**demigodess** *noun*

نیمچەخوداژن، لاخودا، نیوەخودا، نیمچەخوابانوو ۞ نیمه‌خدا (زن)

**demijohn** /ˈdemidʒɒn, US -dʒɑ:n/ *noun*

دیمیجان، حەسیرپۆش، شووشەکوویە ۞ قرابه

**demilance** *noun*

نیوەنیزە، لانەیزە، لاڕم، نیمچەڕم، نیوەڕم ۞ نیم‌نیزه

**demilitarization** /ˌdi:ˌmɪlɪtəraɪˈzeɪʃn, US -rəˈz-/ *noun*

نەهێشتنی هەر دیاردەیەکی سەربازی یان لەشکری (لە وڵات و هتد) ۞ غیرنظامی‌سازی

**demilitarized** *adjective*

ناسەربازی(کراو)، نامیلیتاریزە، پاکەوەبوو لە هەر دیاردەیەکی سەربازی ۞ غیرنظامی(شده)

**demilitarized zone** *noun*

ناوچەی ناسەربازی ۞ منطقه‌ی غیرنظامی

**demilune** /ˈdemɪlu:n/ *noun*

نیوەبازنە، مانگیلە، نیوەمانگ، شتێکی نیوەبازنەیی ۞ هلال، چیز هلالی

**demimondaine** /ˈdemɪmɒnˌdeɪn, French dəmimɔ̃dɛn/ *adjective*

بەرگومان، گومانلەسەر، گوماناوی، جێیشک ۞ مشکوک

**demi-monde** /ˌdemi ˈmɒnd, US ˈmɑ:nd/ *noun*

1 (فەرەنسی) کەسانی جێیشک یان گومانلەسەر یان گومانبار 2 ژنانی گوماناوی یان هەرزە ۞

1 آدەمهای مشکوک 2 زنهای مشکوک
**demineralization** *noun*
لابردنی خوێ و کان له شتێ ◌ دمینرالیزاسیون
**demining** *noun*
(سەربازی) سڕینەوەی مین، نەهێشتنی مین، مینسڕی ◌ مینزدایی
**demi-pension** /ˌdɛmɪˈpɒ̃sjɒ̃, French dəmipɑ̃sjɔ̃/ *noun*
هوتێلێ به تەختی خەو، نانی بەیانی و ژەمێکی سەرەکی لە ڕۆژدا (بنەڕەت: واتای خۆی یانی "لەتەنان، پەنجک") ◌ دمیپنسیون
**demise** /dɪˈmaɪz/ *noun*
1 مردن 2 (خوازە) نەمان، تیاچوون، پووکانەوە، پووچانەوە 3 نابووتی، مایەپووچی، بەرشکستی 4 مەرگ 5 پێسپاردن، ڕاگوێستن ◌ 1 درگذشت 2 (مجازی) سقوط، اضمحلال 3 ورشکستگی 4 مرگ 5 واگذاری
**demisemiquaver** /ˌdɛmɪˈsɛmɪˌkweɪvə/ = thirty-second note
**demission** /dɪˈmɪʃən/ *noun*
لاچوون، خۆکێشانەوە، وازلێهێنان، پێسپاردن ◌ کنارەگیری، واگذاری
**demister** /ˌdiːˈmɪstə(r)/ *noun*
(ماشێن) شووشەگەرمکەر، (دەزگای) تەمڕەوێن ◌ گرمکن شیشه
**demitasse** /ˈdɛmɪtas/ *noun*
پیالەقاوەی چکۆلە ◌ فنجان قهوەی کوچک
**demiurge** /ˈdiːmɪəːdʒ, US ˈdɛm-/ *noun*
(لە فەلسەفەی ئەفلاتوونیدا) دروستکەری جیهان ◌ خالق جهان
**demiurgic** /-ˈəːdʒɪk/ *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە demiuge ـەوە هەیە ◌ وابسته به demiuge
**demo-** *prefix*
پێشگر: گەل، خەڵک، دانیشتووان، حەشیمەت (بنەڕەت: لە *dēmos* یۆنانییەوە) ◌ پیشوند: مردم، جمعیت
**demo** /ˈdɛməʊ, US -moʊ/, *pl.* demos = demonstration
**demob** /ˌdiːˈmɒb, US -ˈmɑːb/ = demobilization
**demobilization** /dɪˌməʊbəlaɪˈzeɪʃn, US -ˌmoʊbələˈz-/ *noun*
ئازادکردن، بەردان، ناردنەوە، بڵاوەپێکردن، بەرەڵاکردن (لە سەربازی) ◌ مرخص کردن از خدمت
**democracy** /dɪˈmɒkrəsi, US -ˈmɑːk-/ *noun, pl.* democracies
دیموکراسی ◌ دموکراسی، مردمسالاری
**democrat** /ˈdɛməkræt/ *noun*
1 لایەنگری دیموکراسی، مرۆڤی دیموکرات 2 (Democrat) (لە ئەمریکا) ئەندام یان لایەنگری پارتی دیموکرات ◌ 1 هوادار دموکراسی 2 (با D) عضو یا طرفدار حزب دموکرات
**democratic** /ˌdɛməˈkrætɪk/ *adjective*
دیموکراتیک، دیموکرات ◌ مردمسالارانه، دموکراتیک، دموکرات
**Democratic** /ˌdɛməˈkrætɪk/ *adjective*
(لە ئەمریکا) سەربە یان لایەنگری پارتی دیموکرات ◌ وابسته به یا طرفدار حزب دمکرات
**democratically** /-kli/ *adverb*
بە شێوەیەکی دیموکراتیک ◌ به طور دمکراتیک
**Democratic Party** *noun*
(لە ئەمریکا) پارتی دیموکرات ◌ حزب دموکرات
**democratization** /dɪˌmɒkrətaɪˈzeɪʃn, US -ˌmɑːkrətəˈz-/ *noun*
کردنە دیموکراتیک، ئازادیپێدان، ئیموکراتیزاسیۆن ◌ دموکراتیک کردن
**démodé** /deɪˈməʊdeɪ/ *adjective*
لەباوکەوتوو، بێباو، لەبرەوکەوتوو، برەونەماو، ◌ out-of-date ازمدافتاده
**demodulation** *noun*
دۆزینەوە، دەرخستن ◌ کشف
**demographer** /dɪˈmɒgrəfə(r), US -ˈmɑːg-/ *noun*
دیمۆگرافیر، دیمۆگرافیر، حەشیمەتناس ◌ جمعیتشناس
**demographic** /ˌdɛməˈgræfɪk/ *adjective*
سەربە دیمۆگرافی، دیموگرافیک، سەربەحەشیمەتناسی، حەشیمەتی: ◌ *demographic changes/trends/factors* جمعیتشناختی، جمعیتی
**demographic change** *noun*
گۆڕانی دیمۆگرافی (یان حەشیمەتی) ◌ تغییر جمعیتی
**demographics** /ˌdɛməˈgræfɪks/ *noun, pl.*
(سەرژمێری) ئەو زانیارییانەی کە پێوەندییان بە حەشیمەت یان گرووپەکانی نێویەوە هەیە: *the ~ographics of radio listeners* ◌ دموگرافیک
**demography** /dɪˈmɒgrəfi, US -ˈmɑːg-/ *noun*
دیمۆگرافی، حەشیمەتناسی ◌ جمعیتشناسی
**Demoi** = plural form of Demos
**demoiselle** /ˌdɛmwɑːˈzɛl/ *noun*
(کۆن، ویژەیی) ژنی لاو یان گەنج ◌ زن جوان
**demoiselle crane** *noun*
جۆرێ شینەقورینگی چکۆلە [ *Anthropoides virgo*] ◌ نوعی درنا
**demolisher** *noun*
وێرانکەر، تێکدەر، ڕووخێنەر، تێکتەپێنەر ◌ ویرانکننده
**demolition** /ˌdɛməˈlɪʃn/ *noun*

1 تێکدان، هەڵتەکاندن، هەرەماندن، کاول کردن، خاپوورکردن، تێکتەپاندن 2 (تیۆری و هتد) هەڵوەشاندنەوە، هەڵتەکاندن، بەتاڵ کردنەوە، پووچاندنەوە ◌ 1 تخریب 2 ابطال

**demon**[1] /'di:mən/ *noun, adjective*

*n* 1 شەیتان، رۆحی خراپ یان شەیتانی، هێزی شەیتانی 2 دێو، جنۆکە، رمووزن، درنج 3 = daemon *adj* 1 بەکار، ماندوویی نەناس، دیۆناسا، شەیتان، بەجەنگ، کۆڵنەدەر 2 خراپ، شەیتانی ◌ *n* 1 شیطان، روح شریر، نیروی شیطانی 2 جن، دیو 3 = daemon *adj* 1 سخت‌کوش 2 شیطانی

**demon**[2] *noun*

(نافەرمی، ئەوستراڵیا) ئەفسەری پۆلیس ◌ افسر پلیس

**the demon drink** *noun*

(بە شۆخی) خواردنەوەی ئەلکوڵی، ئارەقی لامەسەب ◌ مشروب الکلی

**demonetization** *noun*

لەگەڕخستنی پارەی کاغزی یان کوینی ◌ دمونتیزاسیون

**demoniac** /dɪ'məʊniak/ *adjective, noun,* also demoniacal

*adj* شەیتانی، دێوی، پیس، خراپ، سەخت، توند، بێ‌ئەمان، در، توندوتیژ، پێنەویراو، کۆنترۆڵنەکراو، هەوسارپساندوو *n* کەسێ کە شەیتان چووبێتە کلێشەیەوە ◌ *adj* شیطانی، خبیث، شدید، بی‌امان، عنان‌گسیخته *n* آدم جن‌زده

**demonic** /di'mɒnɪk, US -'mɑ:n-/ *adjective,* also demonical

شەیتانی، پیس، خراپ، چەپەڵ، گڵاو ◌ شیطانی، خبیث

**demonically** /di'mɒnɪkli, US -'mɑ:n-/ *adverb*

شەیتانی‌یانە، بە شێوەیێکی خراپ ◌ بەطور شیطانی

**demonism** /'di:məniz(ə)m/ *noun*

1 دێوباوەری، دێوپەرستی 2 جووڵانەوە یان کردەوەی شەیتانی یان دێوی ◌ 1 دیوگرایی 2 رفتار شیطانی

**demonist** /'di:mənɪst/ *noun*

دێوباوەڕ، دێوپەرست ◌ دیوگرایی

**demono-** /'di:mənəʊ/ *prefix*

پێشگر: دێو: *demonolatry* ◌ پیشوند: دیو

**demonolatry** /ˌdi:mə'nɒlətri/ *noun*

دێوپەرستی ◌ دیوپرستی

**demonological** *adjective*

سەربە دێوناسی، دێوناسی‌یانە ◌ دیوشناختی

**demonologist** *noun*

دێوناس ◌ دیوشناس

**demonology** /ˌdi:mə'nɑ:lədʒɪ/ *noun*

دێوناسی ◌ دیوشناسی

**demons** *noun, pl.*

دێوودرنج، شەیتان و جنۆکە ◌ شیاطین

**demonstrability** /ˌdemənstrə'bɪləti/ *noun*

لەسەلماندن‌هاتوویی، دیاربوون، بەرچاوبوون، لەبەرچاوی ◌ اثبات‌پذیری

**demonstrable** /dɪ'mɒnstrəbl, US -'mɑ:n- 'demənstrəbl/ *adjective*

لەسەلماندن‌هاتوو، دەسەلمێنرێ، دیار، بەرچاو، لەبەرچاو ◌ اثبات‌پذیر

**demonstrably** /-bli/ *adverb*

لەسەلماندن‌هاتووانە، بە شێوەیێ کە بسەلمێنرێ ◌ به طور اثبات‌پذیر

**demonstration** /ˌdemən'streɪʃn/ *noun*

1 پیشاندان، نیشاندان، نمایشت، دەرخستن، خستنەڕوو 2 باس‌کردن، پیشاندانی شێوەی کار (کردنی شتێ) 3 سەلماندن، پشت‌ڕاست‌کردنەوە 4 بەڵگە 5 دەربڕین، وتن 6 خۆپیشاندان، گەلەکۆیی، رێپێوان، کۆبوونەوەی گشتی 7 پیشاندانی هێزی میلیتاری ◌ 1 نمایش 2 شرح 3 اثبات 4 دلیل 5 ابراز 6 تظاهرات 7 نمایش قدرت نظامی

**demonstrative** /dɪ'mɒnstrətɪv, US -'mɑ:n-/ *adjective, noun*

*adj* 1 گەرم(وگوڕ)، بەسۆز، دڵسۆز: *a* *Some people* ◊ *demonstrative greeting* 2 *are more demonstrative than others* سەلمێنەر 3 دەربڕ، نیشاندەر، پیشاندەر، دەرخەر 4 (ڕێزمان) نیشانە، ئاماژە (وەک *this,* *that, those*) *n* ناوەڵناو یان جێناوی نیشانە ◌ *adj* 1 باز 2 اثبات‌کننده 3 بیان‌گر 4 (دستور زبان) اشاره *n* صفت یا ضمیر اشاره

**demonstratively** /dɪ'mɒnstrətɪvli, US -'mɑ:n-/ *adverb*

دڵسۆزانە، بە گەرمی، بەسۆزانە ◌ با احساسات

**demonstrativeness** /dɪ'mɒnstrətɪvnəs, US -'mɑ:n-/ *noun*

گەرم‌بوون، بەسۆزی، دڵسۆزی ◌ احساساتی بودن، برون‌گرایی

**demonstrative pronoun** *noun*

(ڕێزمان) جێناوی نیشانە (یان ئاماژە) ◌ ضمیر اشاره

**demonstrator** /'demənstreɪtə(r)/ *noun*

1 (demonstrators) خۆپیشاندەران: *Troops* 2 *opened fire on the demonstrators* دوافرۆشیار، ناوەڵ‌فرۆشیار (کەسێ کە شێوەی کارکردنی شتەکان نیشانی خەڵک دەدا) ◌ 1 (در جمع) تظاهرکنندگان 2 کمک‌فروشنده

**demoralization** /dɪˌmɒrəlaɪ'zeɪʃn, US -ˌmɔ:rələ'z-, -ˌmɑ:rələ'z-/ *noun*

ورەداشکاندن، دابەزاندنی ورە، دڵساردکردنەوە، ناهومێدی (demoralizer *n*) ◌ تضعیف روحیه، یأس

**demoralized** *adjective*
ناهومێـد، دڵـــسارد، دەس‌داشـــواردوو، شـــپرزە، بێ‌هیوا، بێ‌ورە ◌ مأیوس

**demoralizing** /dɪˈmɒrəlaɪzɪŋ/ *adjective*
ناهومێدکەر، دڵساردکەر، هیوابڕ: *the -ralizing effects of unemployment* ◌ یأس‌آور

**demoralizingly** *adverb*
ناهومێدکەرانە، هیوابڕانە ◌ به طور یأس‌آور

**Demos** /ˈdiːmɒs/ *noun, pl.* Demoi /ˈdiːmɔɪ/
خەڵـکی ئاسایی یـان ڕەمـەکی، جـەماوەر (هـی دەوڵـەتی یۆنـانی کـۆن، بنـەڕەت: لـە *dēmos* یۆنانی‌یەوە) ◌ تودەی مردم

**demotic** /dɪˈmɒtɪk, US -ˈmɑːt-/ *adjective*
1 (فەرمی) ئاسایی، عەدەتی، خۆماڵی، ڕەمەکی، گـــــشتی، :common ,popular ,colloquial *demotic idiom* ◊ *demotic language/speech* 2 ئاماژە بـە شـێوەیێکی تێک‌چـڕژاو و سـادەوەبـووی simplified خـەتی میـسری‌یـانی کـۆن (بڕوانـە hieratic) ◌ 1 عـادی، معمـولی 2 دموتیک

**Demotic** /dɪˈmɒtɪk/ *noun*
زمانی نوێی یۆنـانی (بڕوانـە katharevousa) ◌ زبان یونانی جدید

**demotion** /ˌdiːˈməʊʃn, US -ˈmoʊ-/ *noun*
نزم‌بوونەوە، لێژبوونەوە، هاتنەخوارەوە، دابـەزین، داکەوتن، داشکان (پلەوپایە) ◌ تنزل مقام

**demotivating** /ˌdiːˈməʊtɪveɪtɪŋ, US ˌdiːˈmoʊtɪveɪtɪŋ / *adjective*
دڵساردکەرەوە، لەگوڕخەر ◌ دلسردکننده

**demotivation** /ˌdiːməʊtɪˈveɪʃn, US -moʊ-/ *noun*
دڵساردکردنەوە، لەگوڕخستن ◌ دلسردکردن

**demulcent** /dɪˈmʌls(ə)nt/ *adjective, noun*
*adj* هێورکـەرەوە، ئـارامکـەرەوە، ژانشـکێن *n* مەرهەم، هەتوان، مەلهەم، دەرمـانی مەڵـهەمی ◌ *adj* آرام‌بخش *n* مرهم، داروی مرهمی

**demur** /dɪˈmɜː(r)/ *noun*
1 نارەزایی‌دەربڕین، لاری، دژایـەتی 2 دوودڵـی، شـک، گومـان، دڕدۆنگـی: *They accepted without -mur* ◌ 1 اعتراض، مخالفت 2 تردید

**demure** /dɪˈmjʊə(r), US dɪˈmjʊr/ *adjective* (demurer, demurest)
قورس، سەنگین، بەسام، مەند، بەحـەیا، بەشـەرم، بەشەرمانە، :reserved *a demure young lady* ◊ *a demure smile* ◌ متین، موقر، موقرانه

**demurely** *adverb*
بە مەندی، بە حـەیاوە: *'I'll think about it,' she said demurely* ◌ با وقار

**demureness** /dɪˈmjʊənəs, US dɪˈmjʊrnəs/ *noun*
قورسی، سەنگینی، بەسامی، بەئابڕوویی، مەنـدی، بەحەیایی، بەشەرمی ◌ متانت، وقار

**demurrage** /dɪˈmʌrɪdʒ/ *noun*
(پێبژاردنی) بێکارمانەوە ◌ دیموراژ

**demurral** *noun*
نـارەزایی‌دەربـڕین، دژایـەتی، بەرهەڵـستی ◌ اعتراض، مخالفت

**demurrer** /dɪˈmɜːrə/ *noun*
(ماف) لاری‌بوون لە لێهاتوویی دادگا ◌ دمیورر

**demy** /dɪˈmʌɪ/ *noun*
1 کاغزێ بە ئەندازەی 444 × 564 mm 2 (هەروەها demy octavo) کتێبێ بە ئەندازەی 138 × 216 mm 3 (هەروەها demy quarto) کتێبێ بە ئەندازەی 219 × 276 mm ◌ دیمی، دیمای

**demyelinating** *adjective*
(پزشکی) دەبێتەهۆی دەسـتدان یان وێران‌بوون و تیاچوونی مـۆخین :myelin *demyelinating diseases* ◊ *a demyelinating agent* ◌ دی‌مای‌الیناتینگ

**demyelination** *noun*
(پزشـکی) لـە دەسـتدان یـان وێـران‌بـوون و تیاچوونی مۆخین myelin ◌ دی‌مای‌الیناسیون

**demystification** /ˌdiːˌmɪstɪfɪˈkeɪʃn/ *noun*
ڕوون‌کردنـەوە، لێکدانـەوە، شـیکردنـەوە، ئاسان‌کردنەوە ◌ ابهام‌زدایی

**den** /den/ *noun*
1 ئەشکەوت، کـەورگ 2 کـون، کولانـە، بـوودر، گـووف، لانـە، کـەڵـما (هـی ورچ و پـڵـنگ) 3 حەشارگە، شـوێنی کۆبوونـەوەی نهێنی، کـون، مـەکۆ 4 جێگـای چـۆڵ یـان خەڵـوەت، دیـوی چۆڵ، دینج (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ 1 غـار 2 کنـام 3 مخفی‌گاه، پاتوق 4 خلوت‌گاه

**denar** /ˈdiːnə/ *noun*
یەکەی بنەڕەتی پارەی Macedonia ◌ دینار

**denarius** /dɪˈneːrɪəs, dɪˈnɑːrɪəs/ *noun, pl.* denarii /-rɪʌɪ, -riː/
1 کۆینێکی زیوینی ڕۆمی کۆن، لە بنـەڕەتا بـایی 10 as 2 کۆینێکی زێڕینی ڕۆمی کۆن بـایی 25 denarius (بنـەڕەت: بـە واتـای "دەی تیایـە") ◌ دناریوس

**denary** /ˈdiːn(ə)ri/ *adjective*
دەیی، سـەربە یـان لەسـەر بنـەمای ژمـارەی دە، پێوەندی بە ژمارەی دەوە هەیە ◌ وابـسته بـه یـا براساس شمارەی ده

**denationalization** /ˌdiːˌnæʃnəlaɪˈzeɪʃn, US -ləˈz-/ *noun*
تایبـەتی‌کـردن، لـە خـاوەن‌داری حکومـەت یـان دەوڵەت لابردن، ڕاگوێـستن بۆ کـەرتی تایبـەتی ◌ واگذاری به بخش خصوصی

**denaturalization** *noun*

1 ناسروشتاندن، ناسروشتی‌کردن 2 بێ‌بەشاندن یـان بـێ‌بـەش‌کـردن لـە مـافی هـاوولاتیتی، بـێ‌بـەری‌کـردن لـە مـافی هـاوولاتیتی ۞ 1 غیرطبیعی‌سازی 2 محروم‌سـازی از حقـوق تبعـەی کشوری

**denaturation** *noun*

1 گۆڕینی سروشتی پرۆتینی، سروشت‌گۆڕی 2 گـۆڕین 3 گـۆڕینی سروشـت ۞ 1 تخریـب پروتئینی 2 تقلیب 3 قلب ماهیت

**denatured** *adjective*

گۆڕاو؟ ۞ تقلیبی

**denatured alcohol** *noun*

ئەلکولی گۆڕاو، ئەلکولی پیشەسازی ۞ الکـل تقلیبی

**dendr(o)-** /ˈdɛndrəʊ/ *prefix*

پێـشگر: دار، دارئاسـا، شـێوەدار، دارەکـان: *dendrology* (بنـەڕەت: لـە *dendron* یۆنـانی "tree") ۞ پیشوند: درخت، درخت‌مانند، درختان

**dendriform** *adjective*

دارئاسا، داراسا، شێوەدار، لەدارچوو ۞ درخت‌مانند

**dendrite** /ˈdɛndrʌɪt/ *noun*

دارە، سادار، دارئاسا، داراسا، دیندریت ۞ دندریت

**dendritic** /dɛnˈdrɪtɪk/ *noun*

دارەیـی، سـاداری، سـەربە یـان پێـوەنـدی بـە دیندریتەوە هەیە ۞ وابسته به دندریت

**dendrochronological** *adjective*

سـەربە تەمـەن‌ناسی دار، دارتەمـەن‌ناسـی‌یانـە ۞ سن‌شناختی درختان

**dendrochronologist** *noun*

تەمـەن‌نـاس لـەبواری داردا، دارتەمـەن‌نـاس ۞ سن‌شناس درختان

**dendrochronology** *noun*

تەمەن‌ناسی دار، دارتەمـەن‌ناسـی ۞ سـن‌شناسـی درختان

**dendrogram** /ˈdɛndrə(ʊ)gram/ *noun*

هێـلکاری داری، دیـاگرامی داری، دارۆگـرام ۞ نمودار درختی

**dendroid** /ˈdɛndrɔɪd/ *adjective*, also dendroidal

دارئاسا، شێوەدار، لقاوی، لقن ۞ درخت‌مانند

**dendrolatry** *noun*

دارپەرستی ۞ درخت‌پرستی

**dendrological** *adjective*

سەربە دارناسی ۞ درخت‌شناختی

**dendrologist** /denˈdrɒlədʒɪst, US -ˈdrɑːl-/ *noun*

دارناس ۞ درخت‌شناس

**dendrology** /denˈdrɒlədʒi, US -drɑːl-/ *noun*

دارناسی ۞ درخت‌شناسی

**Dene** /ˈdɛneɪ, US ˈdɛni/ *noun, pl.* same

1 ئەنـدامی کۆمەڵـێ لـە گـەلانی سووریێـستی باکوور و ڕۆژاوای کەنەدا و ئەلاسکا 2 هەریەک لە زمانانی Athabaskanی ئەو گەلانە ۞ دنی

**dene** /diːn/ *noun*, also dean

(بریتانیا) دۆڵی تەنگ، قووڵ و دارستانی ۞ دین

**dengue** /ˈdeŋgi/ *noun*, also dengue fever or breakbone fever

(پزشکی) تێ یان تـای دانگ (جۆرێکی ئاسـتەم بەهۆی flavivirus (جۆرێ *Dengue virus*ی توخمی *Flavivirus*) ۞ تب دانگ

**deniable** /dɪˈnaɪəbl/ *adjective*

لەنکۆڵی‌هاتوو، شیاوی بەدرۆخـستنەوە، نکۆڵـی لـێ‌دەکرێ، بـەدرۆ دەخرێتـەوە ( deniability /dɪˌnaɪəˈbɪlətɪ/: لەنکۆڵی‌هاتوویی) *n* ۞ قابـل تکذیب، انکارپذیر

**denial** /dɪˈnaɪəl/ *noun*

بەدرۆخـــستنەوە، نکۆڵـــی(لـــێ‌کـــردن)، مانـدەل(کـردن)، حاشـاکردن، پـەرچ‌دانـەوە، پەســندنەکردن، وەرنــەگرتن، ڕەددانــەوە، ڕەت‌کردنەوە: *the denial of basic human rights* ۞ تکذیب، انکار، عدم پذیرش

**denier**[1] /ˈdeniə(r)/ *noun*

1 دینیەر (= یەکەی پێوانی ئاسکی (باریکی) نـایلۆن، خـوری و هتـد) 2 کـۆینێکی پێـشووی فەڕەنـسە، بەرامبەر بـە دوازدەیـەکی souیـێ ۞ دنیر

**denier**[2] /ˈdeniə(r)/ *noun*

بەدرۆخـەرەوە، نکۆڵـی‌لێکـەر، بەرپـەرچ‌دەرەوە، ڕەت‌کەرەوە ۞ تکذیب‌کننده، انکارکننده

**denigration** /ˌdenɪˈgreɪʃn/ *noun*

بەکـەم‌گرتن، بەهێندنـەگرتن، سـووک‌کـردن، بـە فـشەگرتن، بـەهیچ‌دانـان، بـەچاوی سـووک چاولێ‌کردن، تێ‌چاندن، نێوزڕان، ئابڕووچوون، حەیانەمان ۞ دست‌کم‌گیری، بدنامی، آبروریزی

**denigrator** *noun*

سـووکایەتی‌پـێ‌کـەر، نێـوزڕێن، ئابڕووبـەرە، سـووکێنەر، زڕێنـەر، تـێ‌چـێن، بـەهیچ‌دانـەر ۞ تحقیرکننده، بدنام‌کننده

**denim** /ˈdenɪm/ *noun, adjective*

*n* پارچەی دمین (بۆ جـین بەکاردێنرێ) *adj* 1 جـــین، لی 2 (denims) شەلـــواری لی ۞ *n* پارچەی دمین *adj* 1 جین 2 شلوار جین

**denitrification** *noun*

نایتریـــتلـــێ‌لابـــردن، نیتـــرات‌گ(یـــ)ری ۞ نیترات‌زدایی

**denizen** /ˈdenɪzn/ *noun*

1 دانیـــشتوو، جێـــوار، ئـــاکنجی، نیـــشتەجێ 2 بیـانی‌یێ کـە مـافی دانیـشتوانی ڕەسـەنی (لـە ولاتێ وەرگـیراودا) پـێ‌دراوە 3 گیانـەوەر یـان ڕووەکـی شـوێنێکی تایبـەتی، گیـای خۆماڵـی 4 وشـەی خۆماڵـی‌کـراو ۞ 1 مقـیم 2 دنیـزن 3

حیوانی بومی، گیاه بومی 4 واژەی بومی‌شده

**denominable** *adjective*

ناوی لێ‌دەنرێ، لەنێونانهاتوو ۞ تسمیه‌پذیر

**denominal** /dɪˈnɒmɪnəl/ *adjective*

(وشەیێ) دارێژراو لە ناو ۞ مشتق از اسم

**denomination** /dɪˌnɒmɪˈneɪʃn, US -ˌnɑːm-/ *noun*

1 ناونـــان، ناولێنـــان، نێولەســـەردانان، نـــاو 2 دەستایین، تیرە، گـروپ یـان کۆمەڵێکی دینی 3 یەکە، یەکینە 4 نرخ، بایی 5 ژێرەی هاوبەش، هاوژێرە ۞ 1 نامگذاری، نـام 2 فرقـه 3 واحـد 4 ارزش 5 مخرج مشترک

**denominational** /dɪˌnɒmɪˈneɪʃənl, US -ˌnɑːm-/ *adjective*

سەربە دەستایین، سەربە گروپ یان کۆمەڵێکی دینی ۞ فرقه‌ای

**denominationalism** *noun*

تیرەگەری دینی یان ئایینی، دەستەگەری دینی ۞ فرقه‌گرایی

**denominational schools** *noun, pl.*

خوێندنگا دەستایینی‌یەکان یان تیرە دینی‌یەکان، قوتابخانەی کۆمەڵێکی تایبەتی ئایینی یان دینی ۞ مدارس فرقه‌ای

**denominator** /dɪˈnɒmɪneɪtə(r), US -ˈnɑːm-/ *noun*

ژێرە (ی کەرت) ۞ مخرج

**de nos jours** /ˌdə nəʊ ˈʒʊə, French də no ʒuʀ/ *noun*

هاوچەرخ، هاوسەردەم، هاورۆژگار، هاوکات ۞ معاصر، هم‌زمان

**denotation** /ˌdiːnəʊˈteɪʃn, US -noʊ-/ *noun*

1 (روو)واتا، مانا، واتای ئاشکرا یان دیار، راستەواتا 2 نیشانە، هێما، دروشم، درف: *visible denotations of divine wrath* 3 نیشانەی (شتێ) بوون، واگەیاندن، ئاماژەپێ‌کردن ۞ 1 معنی، معنی اصلی یا صریح 2 علامت، نماد 3 دلالت

**denotational** /ˌdiːnəʊˈteɪʃnl, US -noʊ-/ *adjective*

سەربە denotation ۞ وابسته به denotation

**denotative** /-tətɪv/ *adjective*

بە نیشانە (ی شتێ)بوو، ئاماژەپێ‌کەر؛ سەربە یان پێوەندی بە denotationـەوە هەیە ۞ دلالت‌کننده

**denouement** /ˌdeɪˈnuːmɒ̃, US ˌdeɪnuːˈmɑ̃ː/ *noun*

گرێ‌کردنەوە، رەوێنگە، ئاکام (دوایین بەشی درووژێنەری رۆمان، شانۆنامە وهتد) ۞ گره‌گشایی

**denouncement** *noun*

1 ئاگادارکردنـــەوە، هەرەشـــە(لـــێ‌کـــردن) 2 هەڵوەشاندنەوە، بەتاڵ‌کردنەوە، پووچەڵ‌کردنەوە ۞ 1 اخطار، تهدید 2 الغا

**de novo** /deɪ ˈnəʊvəʊ, US diː/ *adverb, adjective*

(لاتین) سەرلەنوێ، دیسان، anew: *a case tried de novo* ۞ مجدداً، از نو

**dense** /dens/ *adjective*

1 خەست، چڕ، تیر، تۆلا، پڕ، پۆر، سفت، توند 2 چڕوپڕ، پڕ، چوغورد، یەک‌تەنیو، پاڵ‌یەک‌چوو، گڤ، تێک‌چرژاو 3 ئاڵۆز، سەخت، گران، قورس، دژوار، لێ‌تێنەگەیشتوو 4 (فیزیک) چڕ 5 گەوج، نەفام، گەمژەڵ ۞ 1 غلیظ، فشرده 2 متراکم 3 پیچیده، بغرنج 4 (فیزیک) چگال 5 احمق، کودن

**dense concrete** *noun*

شفتە یان بێتۆنی خەست، کۆنکرێتی مایەدار ۞ بتون متراکم

**densely** /densli/ *adverb*

بە شێوەیەکی پڕ، تێک‌چرژاوانە: *a densly populated area* ۞ به طور متراکم

**densimeter** *noun,* also densitometer /ˌdensɪˈtɒmɪtə/

چڕی‌پێو ۞ چگالی‌سنج

**densitometric** *adjective*

(densitometrically *adv*) سەربە چڕی‌پێوی ۞ وابسته به چگالی‌سنجی

**densitometry** *noun*

چڕی‌پێوی ۞ چگالی‌سنجی

**density** /ˈdensəti/ *noun,* also denseness, *pl.* densities

1 خەستی، چڕی، تیری، تۆلایی، پڕی، پۆری، تونـــدی 2 چڕوپـــڕی، پـــڕی، چوغـــوردی، یەک‌تەنیوی، پاڵ‌یەک‌چوویی، تێک‌چرژاوی: *low density forest* 3 ئاڵۆزی، سەختی، گرانی، قورسی، دژواری، لێ‌تێنەگەیشتوویی 4 (فیزیک) چڕی (پێوەندی کێش لەگەڵ بارستایی): *the density of a gas* ۞ 1 غلظت، فشردگی 2 انبوهی 3 تراکم، پیچیدگی 4 چگالی

**dent** /dent/ *noun*

1 قوپان، قوپاوی، داکەوتوویی، رۆچوویی، قـــووڵ‌داکـــەوتوویی، چـــاڵ‌داکـــەوتوویی، بەنێوداچوویی 2 (خوازە) کون، قولکە، چاڵ 3 لێدان، پیاکێشان ۞ 1 فرشدگی، فرورفتگی 2 (مجازی) سوراخ 3 ضربه

**dental** /ˈdentl/ *adjective, noun*

*adj* ددانی، ســـەربە ددان یـــان ددانـــەکان *n* (دەنگ‌ناسی) نەبزوێنی ددانی (سەری زمان بە ددانی سەرەوە وەک: *th*، یان بە پووکەوە وەک: *t, d, n*) ۞ *adj* دندانی، وابسته به دندان یا دندان‌ها *n* صامت دندانی

**dental floss** *noun*

دەزووی ددان، بەنی ددان ۞ نخ دندان

**dental hygiene** *noun*

خاوێن‌راگرتنی دەم و ددان ۞ بهداشت دهان و

دندان

**dental hygienist** *noun*
پسپۆری خاوێنڕاگرتنی دەم و ددان ◌ متخصص بهداشت دهان و دندان

**dentalium** /dɛnˈteɪlɪəm/ *noun*
شفرە (لەپکەیێ کە وەک شتی جوانی یان پارە بەکاردێتری) ◌ دنتالیوم

**dental plate** *noun*
(ددانسازی) پلاک ◌ پلاک

**dental pulp** *noun*
کرۆکی ددان، کاکڵی ددان ◌ مغز دندان

**dental surgeon** *noun*
دوکتوری ددان، ددانساز، نۆژداری ددان ◌ دندانپزشک

**dental technician** *noun*
ددانساز (کەسێ کە ساز و چاکیان دەکاتەوە) ◌ دندانساز

**dentary** /ˈdɛnt(ə)ri/ *noun, pl.* dentaries
(گیانەوەران) ئێسکی شەویلکەی خواروو کە ددان دێنێ ◌ دنتاری

**dentate** /ˈdɛnteɪt/ *adjective*
(گیانەوەرناسی و رووەکناسی) دانەدانە، برگەبرگە ◌ دندانەدار

**dentation** /denˈteɪʃn/ *noun*
دانە، برگە(برگەبوون) ◌ دندانە

**dented** *adjective*
قوپاو، بەچاڵداکەوتوو، داکەوتوو، قووڵداکەوتوو ◌ قر، قرشدە

**denticle** /ˈdɛntɪk(ə)l/ *noun*
1 (گیانەوەرناسی) ددانی چکۆلە یان چوکڵەی وەک ددان، ددانی ورد 2 دانە، برگە 3 چوکڵە، قەڵبە یان کونگرەی چکۆلە ◌ 1 دندان کوچک 2 دندانە 3 کنگرەی کوچک

**denticulate** /dɛnˈtɪkjʊlət/ *adjective,* also denticulated
ددانبچووک، ددانورد، خاوەنی ددانمشکی، ددانی چکۆلە ◌ دارای دندان کوچک

**denticulation** /den,tɪkjəˈleɪʃn/ *noun*
دانەی ورد، قەڵبە، برگە، کونگرە ◌ دندانەی ریز، کنگرە

**dentiform** /ˈdentəfɔːm/ *adjective*
ددانئاسا، شێوەددان ◌ دندانمانند

**dentifrice** /ˈdɛntɪfrɪs/ *noun*
ددانشۆرە، دەرمای ددانشتن ◌ دندانشوی

**dentil** /ˈdɛntɪl/ *noun*
(بیناسازی) دانۆچکە، دانژە ◌ دنتیل

**dentinal** /ˈdɛntɪn(ə)l/ *adjective*
سەربە توێژی ددان، سەربە توێژەی ددان ◌ وابستە بە عاج دندان

**dentine** /ˈdentiːn/ *noun,* US dentin /-tɪn/
توێژی ددان، توێژەی ددان ◌ عاج دندان

**dentist** /ˈdentɪst/ *noun*
دوکتور یان نۆژداری ددان، ددانکێش، ددانساز، پزشکی ددان ◌ دندانپزشک

**dentistry** /ˈdentɪstri/ *noun*
دوکتوریی ددان، نۆژداریی ددان، پزشکیتی ددان ◌ دندانپزشکی

**the dentist's** *noun*
شوێنی بینینی نەخۆشەکان ◌ مطب دندانپزشک

**dentition** /denˈtɪʃn/ *noun*
ددانەرهاتن، ددانەرکردن ◌ خروج دندان

**dentulous** *adjective*
ددانەدار ◌ دندانەدار

**dentures** /ˈdentʃəz, US -tʃərz/ *noun, pl.*
ددانی عەمەلی، دەستەددان، ددانی تاقم ◌ دندان مصنوعی

**denuclearization** *noun*
سڕینەوە یان نەهێشتنی چەکوچۆڵی نێوکی ◌ زدایش سلاحهای اتمی

**denudation** /,diːnjuːˈdeɪʃn, US -nuː-/ *noun*
1 رووتی، رووتکردنەوە، شەلاندن، هیچلەبەرنەهێشتن، داڕووتاندن، داماڵکاندن، داماڵین 2 (زەویناسی) داڕووتان ◌ 1 برهنگی، برهنەسازی 2 برهنگی

**denuded** *adjective*
رووت، بێبەری لە، بێ، بێبەش لە ◌ لخت، برهنە، عاری از

**denunciation** /dɪ,nʌnsiˈeɪʃn/ *noun*
1 ناپەسندکردن، رووڕەشکردن، سووککردن، شەرمەزارکردن، داڕزاندن: *an angry denunciation of the government's policies* ◊ *All parties joined in bitter denunciation of the terrorists* 2 تاوانبارکردن، گوناهبارکردن، گومانبارکردن 3 ئاگادار (وریا)کردنەوە 4 رەخنە 5 زەمکردن، ناوزڕاندن ◌ 1 تقبیح 2 اتهام 3 اخطار 4 انتقاد 5 بدگویی

**denunciator** *noun*
نابرووبەرە، ناوزڕێن ◌ تقبیحکنندە

**denunciatory** /dɪˈnʌnsɪətəʊrɪ/ *adjective,* also denunciative /-ʃɪətɪv/
تاوانبارانە، گوناهبارانە، گومانبارانە ◌ اتهامآمیز

**deodar** /ˈdiːə(ʊ)dɑː/ *noun*
خوادار (بنەڕەت: لە *devadāru* سانسکریت "divine tree"): جۆرێ cedarی دریژی لقوپۆشۆڕ، رەسەنی هیمالایا [*Cedrus deodara*] ◌ دیودور

**deodorant** /diˈəʊdərənt, US diˈoʊ-/ *noun*
دەرمانی بۆنبڕ، بۆنبرە، بۆگەنبەر، بۆنخۆشکەر: *(a) roll-on deodorant* ◌ ضدبو

**deodorization** /dɪ,əʊdəraɪˈzeɪʃn/ *noun*
نەهێشتنی بۆگەن، بۆنبڕی، بۆگەنبەری ◌ دفع بو

**deodorized** *adjective*
بۆنبراو، بۆن‌خۆش‌کەرلێدراو ۞ ضدبوزده
**deodorizer** *noun*
بۆنبرە، بۆگەنبەر، بۆن‌ڕەوێن، بۆن‌خۆش‌کەر ۞ بوزدا
**deontic** /dɪˈɒntɪk/ *adjective*
(زمانەوانی، وشە یان ڕستەیێ) ئەرک‌دەربڕ، سەربە ئەرک یان پێبەندی وەک چەمکی ئاکاری ۞ دیونتیک
**deontological** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە ئەرک‌ناسی‌یەوە هەیە، ئەرک‌ناسی‌یانە ۞ وظیفه‌شناختی
**deontologist** *noun*
ئەرک‌ناس ۞ وظیفه‌شناس
**deontology** /ˌdiːɒnˈtɒlədʒi/ *noun*
ئەرک‌ناسی ۞ وظیفه‌شناسی
**Deo volente** /ˌdeɪəʊ vɒˈlenteɪ/
(لاتین) خوا حەزکا ۞ ان شاء الله
**deoxygenation** *noun*
لابردنی ئۆکسیژێن لە شتێ ۞ اکسیژن‌زدایی
**deoxyribonucleic acid** /dɪˌɒksɪrʌɪbəʊnjuːˈkleɪɪk/ = DNA
**dep** *abbreviation* 1 departs 2 departure 3 deputy
1 (شەمەندەفەر، فڕۆکە و هتد) دەڕوا، بەجێ‌دێلێ 2 (شەمەندەفەر، فڕۆکە و هتد) کاتی ڕۆیشتن، سەعاتی ڕۆیشتن ۞ 1 حرکت می‌کند 2 ساعت حرکت
**departed** /dɪˈpɑːtɪd, US -ˈpɑːrt-/ *adjective, noun*
*adj* 1 خوالێ‌خۆش‌بوو، لەدەس‌چوو 2 ڕابردوو، چوو، بەسەرچوو، لەدەس‌چوو *n* 1 (the departed) خوالێ‌خۆش‌بوو 2 ڕابردووان، لەدەس‌چووان، مردووان، ڕۆیشتووان ۞ *adj* 1 مرحوم 2 گذشته، سپری‌شده *n* 1 مرحوم 2 درگذشتگان، اموات
**department** /dɪˈpɑːtmənt, US -ˈpɑːrt-/ *noun, abbreviation* Dept.
1 شالیاری، وەزارەت: *the Department of Trade and Industry* 2 ڕێکخراوە، سازی 3 بەڕێوەبەرایەتی، کارگێری 4 بەش، کەرت، لق: *5 the marketing/sales, etc. department* مەڵبەندی چالاکی، گۆڕەپان یان مەیدانی جوولانەوە، بواری چالاکی یان جوولانەوە، بەرپرسایەتی، کار 6 ناوچەی سەربازی، دەفەری لەشکری 7 لق، لک، بوار ۞ 1 وزارت 2 سازمان 3 اداره 4 قسمت 5 حوزەی عمل، مسئولیت 6 منطقه‌ی نظامی 7 رشته
**departmental** /ˌdiːpɑːtˈmentl, US -pɑːrt-/ *adjective*
1 شالیاری‌یانە 2 بەڕێوەبەری‌یانە، کارگێری‌یانە، ڕێکخراوەیی 3 سەربە بەش یان کەرت ۞ 1 وزارتی 2 اداری 3 وابسته به بخش یا قسمت
**Department of Justice** *noun*
(لە ئەمریکا) شالیاری داد، وەزارەتی داد ۞ وزارت دادگستری
**Department of State** *noun*
(لە ئەمریکا) شالیاری یان وەزارەتی دەرەوە ۞ وزارت امور خارجه
**department store** *noun*
(لە ئەمریکا) گەورەدووکان، فرۆشگەی گەورە، فرۆشگای چەندبەشە، کەلەفرۆشگا ۞ فروشگاه بزرگ
**departure** /dɪˈpɑːtʃə(r), US -ˈpɑːrt-/ *noun*
1 ڕۆیشتن، کەوتنەڕێ، ملی ڕێگەگرتن، کۆچ، بەجێ‌هێشتن 2 کاتی ڕۆیشتن، سەعاتی ڕۆیشتن 3 لادان، تێپەڕین، ترازان، دووری، خۆبواردن 4 شێوەی نوێ، ڕێگای تازە، کاری تازە ۞ 1 عزیمت، حرکت، رحلت، ترک 2 ساعت حرکت 3 انحراف 4 روش جدید، راه نو
**departure lounge** *noun*
(فڕۆکەخانە) شوێن یان هۆڵی چاوەڕێ‌مانەوە ۞ سالن انتظار
**departure board** *noun*
تەختەی کاتی ڕۆیشتن ۞ صفحه‌ی ساعات حرکت
**depauperate** /dɪˈpɔːp(ə)rət/ *adjective*
لاواز، پەرەسەندوو بە نیوەچڵی، هەڵنەداو یان پەرەنەسەندوو لەبەر هەژاری، impoverished: *a depauperate fauna* ۞ ضعیف، دپاوپرت
**depauperation** *noun*
لاوازی، پەرەسەندوویی بە نیوەچڵی، هەڵنەدان یان پەرەنەسەندن لەبەر هەژاری ۞ ضعف، دپاوپراسیون
**dependability** /dɪˌpendəˈbɪləti/ *noun*, also dependableness
(لێ)ڕابینراوی، پشت‌پێ‌بەستراوی، باوەڕپێ‌کراوی، سەرڕاستی، متمانەپێ‌کراوی ۞ قابلیت اعتماد
**dependable** /dɪˈpendəbl/ *adjective*
(لێ)ڕابینراو، پشت‌پێ‌بەستراو، باوەڕپێ‌کراو، سەرڕاست، متمانەپێ‌کراو، reliable: *a dependable source of income* ۞ قابل اعتماد
**dependably** /dɪˈpendəbli/ *adverb*
بە شێوەیەکی لێ‌ڕابینراو، پشت‌پێ‌بەستراوانە ۞ به طور قابل اعتماد
**dependants** *noun, pl.*
خێزان، نان‌خۆر (و جێگر) ۞ افراد تحت تکفل
**dependence** /dɪˈpendəns/ *noun*
1 بەستراوی، پێوەبەندی، دیبەندی، پێوەبەستراوی، ناسەربەخۆیی، پاشکۆیەتی، ملکەچی، سەربە(شتێ)بوون، پشت‌پێ‌بەستن، ژێردەستی 2 لێ‌ڕابینین، باوەڕپێ‌کردن، ڕاپەڕموون،

متمانەپێکردن، پشتپێبەستن، پاڵلێدانەوە 3 گیرۆدەیی ◌ 1 وابستگی، اتکا 2 اعتماد 3 اعتیاد

**dependency** /dɪ'pendənsi/ *noun, pl.* dependencies
ولاتی چاودێریکراو، ولاتی پشتیوانیلێکراو ◌ کشور تحت‌الحمایه

**dependent** /dɪ'pendənt/ *adjective, noun*
*adj* 1 بەستە، بەستراو، پێوەبەند، دیبەند، بەندەوار، پەیوەست، پێوەبەستراو، بەند، ناسەربەخۆ، پاشکۆ، سەربەدی، ژێردەست، ملکەچ، سەربە (شتێ بوو)، پشتپێبەستراو 2 نانخۆر 3 گیرۆدە *n* - dependants ◌ *adj* 1 موکول، وابسته، تابع 2 تحت تکفل 3 معتاد

**dependent clause** *noun*, also subordinate clause
(ڕێزمان) دەستەوشەی شوێنکەوتوو، بڕگە یان کلۆزی پێوەبەند ◌ بند وابسته، بند تبعی یا پیرو

**dependent convenant** *noun*, also dependent contract
پەیماننامەی بەستراو یان مەرجدار ◌ معاهدەی مشروط

**dependents** = dependants

**depersonalization** *noun*
نەهێشتنی کەسایەتی ◌ شخصیت‌زدایی

**depiction** /dɪ'pɪkʃn/ *noun*
1 وێنە، باسکردن، باسکرد 2 پیشاندان ◌ 1 عکس، تصویر، توصیف 2 نمایش

**depigmentation** *noun*
کەمکردنەوە یا لابردنی ڕەنگی پێست ◌ دپیگمتاسیون

**depilation** /ˌdepə'leɪʃn/ *noun*
لابردن یان نەهێشتنی موو ◌ موزدایی

**depilator** /'depɪleɪtə(r), US dɪ'pɪlɪtɪ:r/ *noun*
موولابەر، مووبەر، مووسڕ، موونەهێل ◌ موزدا

**depilatory** /dɪ'pɪlətri, US -tɔ:ri/ *noun (pl.* depilatories), *adjective*
*n* دەرمانی لابردن یان نەهێشتنی موو، داڕوو *adj* مووبەر، موولابەر، موونەهێل: *depilatory creams* ◌ *n* مادەی موبر، واجبی *adj* موزدا

**depletion** /dɪ'pli:ʃn/ *noun*
1 کەمبوونەوە، چۆڕەلێهاتن، تەواوبوون 2 خاڵیکردن، بەتاڵکردن، هەڵچۆڕاندن 3 خوێنگرتن ◌ 1 کاهش 2 تخلیه 3 فصد

**depletive** /dɪ'pli:tɪv/ *adjective*, also depletory /dɪ'pli:tɔ:ri/
چۆڕەلێبڕ، تەواوکەر ◌ تهی‌ساز

**deplorability** /dɪˌplɔ:rə'bɪlətɪ/ *noun*, also deplorableness
جێبەزەییبوون، گوناهبوون، شپرزەیی ◌ رقت‌انگیزی، اسف‌انگیزی

**deplorable** /dɪ'plɔ:rəbl/ *adjective*
جێبەزەیی، گوناه، شپرزە، مایەی ناڕەحەتی، جێی داخە، خراپ، دڵتەزێن، جەرگبڕ، پیس، ناخۆش، ناحەز ◌ رقت‌انگیز، اسف‌انگیز، زشت

**deplorably** /-əbli/ *adverb*
بە شێوەیەکی گوناهـ یان ناشیرین، بە ناحەزی، زۆر خراپ، زۆر شپرزە ◌ به طور رقت‌انگیز

**deployment** /dɪ'plɔɪmənt/ *noun*
ڕێکخستن، جێگیرکردن، سەقامگیرکردن، دابەشکردن یان بڵاوکردنەوەی سەربازان و دانانیان لەسەر جێی خۆیان، ئامادەکردن، تەیارکردن ◌ صف‌آرایی، آرایش، آماده کردن

**deplumation** /ˌdɪ'plu:meɪʃn/ *noun*
هەڵوەرینی مژۆڵ، برژۆڵوەرین ◌ ریزش مژگان

**depolarization** *noun*
دیپۆلاریزەیشن، نەهێشتنی جەمسەرگری یا جەمسەرگیری ◌ واقطبش

**depolarizer** *noun*
دیپۆلاریزێر ◌ واقطبنده

**depolitization** *noun*
نەهێشتنی کاریگەری یان کۆنترۆڵی سیاسی ◌ سیاست‌زدایی

**depolymerization** *noun*
(پۆلیمێری) تێشکاندن یان هەڵوەشاندن بۆ پارچە یان یەکەی چکۆلەتر ◌ بسپارزدایی

**deponent** /dɪ'pəʊnənt/ *noun, adjective*
1 شایەدی فەرمی، ئاگاوان یان ئاگادێری فەرمی (کەسێ کە دوای خواردنی سوێند، شایەدییەکەی بە شێوەی نووسراوە دەخاتەڕوو) 2 (ڕێزمان) ئاماژە بەو کار verbانەی کە passive ن بەڵام لە واتادا active ن؛ کاری وا ◌ 1 شاهد کتبی 2 مجهول‌نما؛ فعل مجهول‌نما

**depopulated** *adjective*
چۆڵ، بێدانیشتوو، کەملێدانیشتوو، بێحەشیمەت، کەمحەشیمەت ◌ خالی از سکنه

**depopulation** /ˌdi:ˌpɒpju'leɪʃn, US -ˌpɑ:p-/ *noun*
کەمبوونەوەی دانیشتووان، (بێ)چۆڵکردنی دانیشتووان، کەمکردنەوەی حەشیمەت، خاپووری، کاولی، وێرانی ◌ کاهش جمعیت، ویرانی

**deportation** /ˌdi:pɔ:'teɪʃn, US -pɔ:r't-/ *noun*
دەکردن، وەدەرنان، شاربەدەرکردن، ولاتبەدەرکردن، تاراندن، دوورخستنەوە ◌ اخراج، تبعید

**deportee** /ˌdi:pɔ:'ti:, US -pɔ:r-/ *noun*
دەرکراو، وەدەرنراو، شاربەدەرکراو، ولاتبەدەرکراو ◌ اخراجی

**deportment** /dɪ'pɔ:tmənt, US -'pɔ:rt-/ *noun*
1 (لە ئەمریکا) هەڵسوکەوت، جووڵانەوە،

۞ 1 شیاوی بلاوبوونەوە، لەبلاوبوونەوەهاتوو) پراکنده 2 (نوشته) پراطناب

**diffused light** *noun*

رووناکی بلاوەبوو، شەوقی بلاوەبوو ۞ نور پخشیده

**diffusion** /dɪˈfjuːʒn/ *noun*

1 بلاوبوونەوە، تەنینەوە، وەشان، داگرتن، پەلهاویشتن 2 لێچوون، دزەکردن 3 تێکەڵبوون 4 درێژدادڕی، درێژنووسی، زۆرلێوتن 5 (مرۆڤناسی) بلاوبوونەوەی توخمەکانی فەرهەنگێ لە ناوچە یان گەلێکی ترا (diffusionist *adj, n*؛ diffusionism *n*؛ diffusive /dɪˈfjuːsɪv/ *adj*: 1 بلاوکەرەوە 2 دوورودرێژ، درێژدادڕانە؛ diffusiveness /dɪˈfjuːsɪvnəs/ *n*: درێژدادڕی، درێژدڕی، زۆربلەیی) ۞ 1 پخش، انتشار 2 نشت 3 اختلاط 4 اطناب 5 دیفوسیون

**diffusion of light** *noun*

بلاوبوونەوەی رۆشنایی، بلاوبوونەوەی شەوق یا رووناکی ۞ پخش نور

**dig** /dɪg/ *noun*

1 سیخورمە، مستەکوڵە، گورمیچ، تێکوتان، تێوەژاندن 2 پلار، زیپک 3 دانەوە، هەڵکۆڵین، هەڵکەندن 4 شوێنی دانەوە، شوێنی کە شوێنەوارناسەکان دەیدەنەوە، کۆڵینی شوێنەوارناسییانە ۞ 1 سیخونک 2 کنایە 3 حفاری 4 محل حفاری، حفاری باستانشناسانه

**Digambara** /dɪˈgʌmbərə/ *noun*

دیگامبیرا، ئاسمانپۆش: ئەندامی یەکێ لە دوو تیرەی سەرەکی جاینیزم، کە ماڵی دنیا توور هەڵدەدەن و رووت دەگەڕێن (بڕوانە Svetambara؛ بنەڕەت: لە *Digāmbara* سانسکریت بە واتای "sky-clad") ۞ دیگامبارا

**digamy** *noun*

زەماوەندی دووبارە، شایی دووەم (بڕوانە monogamy) ۞ عروسی مجدد

**diggama** /dʌɪˈgamə/ *noun*

شەشەمین پیتی ئەلفوبێی یۆنانی زوو، رەنگە وەک "w" بێژرابێ ۞ دیگاما

**digastric** /dʌɪˈgastrɪk/ *adjective*

دووزگە، دووسکە، جووتزگ ۞ دوشکمه

**digastric muscle** /dʌɪˈgastrɪk/ *noun*

(توێکاری) ماسوولکەی دووزگە ۞ ماهیچەی دوشکمه

**digenean** /ˌdʌɪdʒɪˈniːən, US dʌɪˈdʒɛnɪən/ *adjective*

(گیانەوەرناسی) دووبەرە، دووەچە، دوورەگەزە، دووهاوخوان: سەربە یان ئاماژە بە کۆمەڵێ لە کرمە پەپوولە fluke مشەخۆرەکان کە تەنیا پێویستیان بە دوو یان چوار هاوخوان host هەیە بۆ تەواوکردنی سووری ژیانیان (بڕوانە monogenean، بنەڕەت: لە ناوی ژێرپۆلی *Digenea* لاتینی نوێ (لە *di-* یۆنانی "twice" + *genea* "race, generation" + -an) ۞ دیژینین

**digest** /ˈdaɪdʒest/ *noun*

1 پوختە، کورتە: *a monthly news digest* 2 (the Digest) کورتەی قانوونی رۆم، لە سەردەمی Justinian ڕێکخرا 3 (کیمیا) ماک یان تێکەڵەیێ لە ئەنجامی هەرس ۞ 1 خلاصه، چکیده 2 و 3 دیجست

**digester** /ˈdaɪdʒest/ *noun*

1 هەرسێنەر 2 کورتکەرەوە، کورتێنەر ۞ 1 گوارنده 2 خلاصه‌کننده

**digestible** /daɪˈdʒestəbl, US dɪ-/ *adjective*

لەهەرسهاتوو، هەرس دەبێ، هەڵدەتاوێ (digestibility /ˌdaɪdʒestəˈbɪlətɪ, US dɪ-/ *n*: لەهەرسهاتوویی) ۞ قابل گوارش

**digestif** /dʌɪˈdʒɛstɪf, US ˌdiːʒɛˈstiːf/ *noun*

هەرسێنە (دوای نان بۆ هەرساندن) ۞ دیجستیف

**digestion** /daɪˈdʒestʃən, US dɪ-/ *noun*

1 هەرس، هەڵتاوان 2 کۆئەندامی هەرس، هێزی هەرساندن 3 توانایی یان هێزی تێگەیشتن ۞ 1 هضم، گوارش 2 دستگاه گوارش 3 قوەی ادراک

**digestive** /daɪˈdʒestɪv, US dɪ-/ *adjective, noun*

*adj* سەربە هەڵتاوان، هەرسی *n* 1 دەرمانی هەرساندن یان هەڵتاواندن 2 (بریتانیا) جۆرێ غورابی سۆستەداری نیمچەشیرین (digestively *adv*) ۞ *adj* وابەستە بە گوارش، گوارشی *n* 1 دوای هاضمه 2 نوعی بیسکویت

**digestive organs** *noun, pl.*

ئەندامە هەرسییەکان، ئەندامانی هەرساندن ۞ اعضا گوارشی

**digestive system** *noun*

کۆئەندامی هەرس، دەزگا یان سیستمی هەڵتاوان ۞ دستگاه گوارش

**digger** /ˈdɪgə(r)/ *noun*

1 هەڵکۆڵ، دەردەر، (لە لێکدانا) ـکۆڵ، ـ هەڵکۆڵ، ـدەردەر 2 دەزگای دانەوە یان هەڵکۆڵین 3 (ئەوسترالیا) بانگی کەسێ کردن بە شێوەی دۆستانە ۞ 1 حفار، ـکن 2 ماشین حفاری 3 دیگر

**digger wasp** *noun*

(گیانەوەرناسی) هەنگەژاڵەکونکەرە، هەنگەژاڵەسمە [خێزانەکانی Sphecidae و Pompilidae: زۆر جۆرن] ۞ نوعی زنبور

**digging** *noun*

هەڵکەندن، هەڵکۆڵین، دانەوە ۞ حفاری، حفر

**diggings** *noun, pl.*

1 شوێنی دانەوە، شوێنی هەڵکەندن یان هەڵکۆڵین 2 کان 3 (نافەرمی، بریتانیا) دیوی بەکرێ ۞ 1 محل حفاری 2 معدن 3 اتاق اجاره‌ای

**dight** /dʌɪt/ *adjective*

دیژیتـــۆنین: جـــۆرێ saponin ســـتێرۆید $C_{56}H_{92}O_{29}$، لـەنێـو گـەڵا و دانی foxglove ئاسایی‌دا هەیە ۞ دیژیتونین، دیجیتونین

**digitoxin** /ˌdɪdʒɪˈtɒksɪn/ *noun*
(کیمیا) دیجیتاکسین، دیژیتۆکسین $C_{41}H_{64}O_{13}$، ئاوێتـەیێ بـە هـەمـان تایبـەتمـەنـدی دیژۆکـسین digoxin، لە foxglove و گیا و رووەکـی تـردا دۆزراوەتـەوە؛ گلایکۆزایـدیکی cardiotonic ژاراوی کـە چـالاک‌ترین پێکهێنـەری digitalis ـەکانن ۞ دیژیتوکسین

**diglossia** /dʌɪˈglɒsɪə/ *noun*
(زمانەوانی) دووزمـانێتی، بارودۆخـێ کـە لـەودا دوو زمـان (یـان دوو شـێوەی هـەر ئـەو زمانـە) لەژێر هەلومەرجێکی جیاوازا لەنێو کۆمەڵگایێ بەکاردێترێن، زۆرتر لەلایەن هەمان ئاخێوەرانەوە (diglossic *adj*: سـەربە دیگلۆسـیا یـان دووزمانێتی) ۞ دیگلوسیا

**dignified** /ˈdɪgnɪfaɪd/ *adjective*
بەسـام، گـەورە، بەشـەوکەت، مەنـد، قـورس، خۆگرتـوو، بـەرێز، بەرێزانـە: *a dignified person/manner/voice* ۞ موقر، متین، موقرانه

**dignifiedly** *adverb*
بەسامانە، بەشەوکەتانە، مەندانە، بە مەندی‌یانەوە ۞ موقرانه، با متانت

**dignitary** /ˈdɪgnɪtəri, US -teri/ *noun, pl.* dignitaries
مرۆی پایەبەرز، بنیادەمی گەورە یان بەشەوکەت ۞ شخص عالی‌رتبه

**dignity** /ˈdɪgnəti/ *noun, pl.* dignities
1 گەورەیی، مەزنی، شەوکەت، شکۆ، فەڕ، سام، ئەندێش، سـەنگ، بەسامی، قورسی، بـەرێزی، مەندی 2 بایەخ، وەج، ئابروو، قەدر، حورمەت، شـان، ریز 3 پلـە، پایـە ۞ 1 عظمـت، وقـار 2 ارزش، اعتبار، شأن 3 مقام

**digoxin** /dɪˈdʒɒksɪn/ *noun*
(کیمیـا) مـاکێکی ژاراوی $C_{41}H_{64}O_{14}$ لـە foxglove (*Digitalis lanata*) و گیـای تـر، وەک تـاودەری دڵـی cardiac بـەکاردێترێ ۞ دیجوکسین

**digraph** /ˈdaɪgrɑːf, US -græf/ *noun*
1 دووپیتە، دووپیتە، پیتی تێکەڵ یان لێکدراو ۞ ligature 3 ← (چاپ) 2 (وەکوو *f* /ph/) حرف مرکب

**digraphic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە دیاگرافەوە هەیە، پێوەندی بە دوونووسەوە هەیە ۞ وابسته به حرف مرکب

**digression** /daɪˈgreʃn/ *noun*
1 لادان لـە بـاس، گـۆڕینی قـسـە (واتـای خـۆی "لاڕەوی"): *After several -ssions, he finally got to the point* 2 دەستەوشەی موعتەریزە ۞ 1 انحراف از موضوع 2 عبارت معترضه

(کۆن) لەبەرکردوو، پۆشیو، بەرگ‌پۆشیو، ساز ۞ لباس‌پوشیده، مجهز

**digit** /ˈdɪdʒɪt/ *noun*
1 (بیرکـاری) ژمـارە، رەنـووس 2 (توێکـاری، گیانەوەرناسی) قامک، پەنجە، تلی، کلک ۞ 1 رقم 2 انگشت

**digital** /ˈdɪdʒɪtl/ *adjective*
1 ژمـارەیی، رەنووسـی، هێژمـاری، دیجیتـاڵ 2 سەربە قامک، پەنجەیی (digitally /ˈdɪdʒɪtəli/ *adv*) ۞ 1 رقمی، عددی 2 انگشتی

**digital computer** *noun*
کـامپیوتێری ژمـارەیی یـان دیجیتـاڵ(ـی) ۞ کامپیوتر رقمی

**digitalin** /ˌdɪdʒɪˈteɪlɪn/ *noun*
دەرمانێ کە پێکهێنەرە چالاکەکانی digitalis ی تیایە ۞ دیجیتالین

**digitalis** /ˌdɪdʒɪˈteɪlɪs/ *noun*
1 (رووەکـناسـی) پەنجـەی خـانم (تـوخم *Digitalis*، لـە خێـزانی figwort، ب.ت. foxglove ـەکـان [*D. purpurea*] 2 گەڵای وشـکەوەبووی گیـاوەکـان کـە وەک هـاندەر یـا تـاودەری دڵ heart stimulant بەکاردێترێ ۞ 1 گل پنجه‌علی 2 دیجیتالیس. برگ خشک‌شده‌ی گل انگشتانه

**digital recording** *noun*
(دەنگ) ریکۆردینگی ژمارەیی ۞ ضبط رقمی

**digital television** *noun*
تەلەفزیۆنی ژمارەیی یان دیجیتاڵ ۞ تلویزیون دیجیتال

**digital watch** *noun*
سەعاتی دیجیتاڵ یان کامپیوتێری یان ژمارەیی ۞ ساعت کامپیوتری

**digitate** /ˈdɪdʒɪtət, US -eɪt/ *adjective*, also dogitoform
(گیانەوەرناسـی و رووەکـناسـی) پەنجـەیی، ئەنگوستی، قامکی ۞ انگشتی، پنجه‌ای

**digitation** /ˌdɪdʒɪˈteɪʃn/ *noun*
1 (گیانەوەرناسـی و رووەکـناسـی) دەربـەرێوی پەنجەئاسا یـان پەنجەیی، قامکە 2 (کـامپیوتێر) گۆڕینی زانیاری بۆ شێوەی ژمارەیی یا دیجیتاڵ، ژماراندن ۞ 1 برآمدگی انگشتی 2 دیجیتاسیون

**digitigrade** /ˈdɪdʒɪtɪˌgreɪd/ *adjective*
(گیانەوەرناسی، شیردەرێ) پەنجەڕەو، پەنجەڕۆ (بڕوانە plantigrade، لە لاتین *digitus* "finger, toe" + *gradus* "-walking") ۞ دیجیتیگرید

**digitization** *noun*
(کـامپیوتێر) ژمـارەیی‌کـردن، کردنـەژمارەیی، ژمارانـدن، رەنووسـاندن، (تێخـستنی زانیـاری بەشـێوەی ژمـارەیی؛ digitizer *n*: (کـامپیوتێر) ژمارێنەر، رەنووسێنەر، دیجیتیزێر) ۞ رقمی‌سازی

**digitonin** *noun*

**digressive** /daɪˈgresɪv/ *adjective*
لەباس‌لادەر: *a -ressive talk* ◌ منحرف‌شونده
**digressively** /daɪˈgresɪvli/ *adverb*
لەباس‌لادەرانە ◌ به طور منحرف‌شونده
**digressiveness** /daɪˈgresɪvnəs/ *noun*
لەباس‌لادەری ◌ منحرف‌شوندگی
**digs** /dɪgz/ *noun, pl.*
دیو یان دەستەدیوی بەکرێ ◌ اتاق یا اتاق‌های کرایه‌ای
**dihaploid** *noun, adjective*
زیندەوەرێ کە لە نیوەی ژمارەی کرۆمۆزۆمەکانی گیانەوەریکی تێتراپلۆئید پێکدێ و زۆرتر پۆلی‌هاپلۆئیدی پێ دەوترێ ◌ دی‌هاپلوئید
**dihedral** /dʌɪˈhiːdr(ə)l/ *adjective, noun*
*adj* دووڕوویی *n* گۆشەی پێکهاتوو بە دوو رووی تەختەوە، گۆشە یان سووچی دووڕوویی ◌ *adj* دووجهی *n* زاویەی دووجهی
**dihedron** *noun*
شێوەی دووڕوو ◌ شکل دووجهی
**dihybrid** /dʌɪˈhʌɪrɪd/ *adjective, noun*
(بۆماوەناسی) دووڕەگەی دووانە: دووڕەگەیێ کە heterozygous ـە سەبارەت بە ئالێلەکانی دوو ژێنی جیاواز (dihybridism *n*) ◌ دوآمیزه
**dihydr- or dihydro-** *prefix*
لێکدران لەگەڵ دوو گەردیلە یان ئەتۆمی هایدرۆژێن: *dihydroergotamine* ◌ ترکیبی از دو اتم هیدروژن
**dihydrochloride** *noun*
دی‌هایدرۆکلۆرید: ماک یان مادەیێ کە لە لێکدانی دوو گەردی ترشەڵۆکی هایدرۆکلۆریک hydrochloric acid بە دەست دێ ◌ دیهیدروکلورید
**dihydroergotamine** *noun*
بەرهەمێکی هایدرۆژێنراو hydrogenated لە ئێرگۆتامین ergotamine $C_{33}H_{37}N_5O_5$، بۆ چارەسەری migraine بەکاردێنرێ ◌ دی‌هیدروارگوتامین
**dihydric** /dʌɪˈhʌɪdrɪk/ *adjective*
(کیمیا، ئەلکۆلێ) خاوەنی دوو کۆمەڵی hydroxyl ◌ دیهیدریک
**dihydromorphinone** *noun*
دی‌هایدرۆمۆرفینۆن: ناوێتەیێکی سڕکەر $C_{17}H_{19}O_3N$ narcotic compound، لە مۆرفین دەگیرێ و وەک ژان‌بڕ analgesic بەکاردێنرێ ◌ دی‌هیدرومورفینون
**dihydroxyacetone** *noun*
هاوپارژە یا ئیزۆمێریکی glyceraldehyde $C_3H_6O_3$، ب.ت. بۆ رەنگاندنی پێست بەکاردێنرێ تا بە شێوەی قاوەیی دەربێ ◌ دی‌هیدروکسی‌آستون

**dik-dik** /ˈdɪkdɪk/ *noun*
جۆرێ antelope کورتەبالای ساڤانای ئەفریکا [توخم *Madoqua*: چەندین جۆرن] (لە ناوی دەنگەکەیەوە هەڵگیراوەتەوە) ◌ نوعی آهو
**dikaryon** *noun*, also dicaryon
دووناوکە: 1 تۆڕەداوێلکەی mycelium کەڕووەکان لەگەڵ ئەو خانانەی کە دوو ناوکی هاپلۆئیدیان تیایە کە لە کاتی بەرهەم هێنان یان زاوزێی خانە نوێکان دابەش‌بوونێکی هاوکات ئەنجام دەدەن (یان دەکەن) 2 جووتە ناوکێ کە هەر کام لە خانەیێکی دایکی جیاوە پێکدێن (dikaryotic *adj*: دووناوکە، دووناوکەیی، سەربە دووناوکە) ◌ دوهسته‌ای
**dike** = dyke
**diktat** /ˈdɪktæt, US dɪkˈtæt/ *noun*
دەستوور، فەرمایشت، فەرمان، فەرموار (بە زۆری بێ، بنەڕەت: لە ئەڵمانی‌یەوە) ◌ حکم، امر
**dilapidated** /dɪˈlæpɪdeɪtɪd/ *adjective*
1 شەق‌وشڕ، داغن، شڕزە، شکاو، لێک‌زەبەردراو، کۆن، شڕ، چەبەرەشڕ 2 خاپوور، داربەسەر بەردەوەنەماو، تێک‌رووخاو، تێک‌ڕماو، کاولە، کاول، کەلاوە ◌ 1 فکسنی، درب و داغون 2 خرابه
**dilapidation** /dɪˌlæpɪˈdeɪʃn/ *noun*
1 کاولی، خاپووری، رووخاوی، تێک‌ڕماوی، وێرانی 2 تێک‌دان، رووخاندن، تێک‌ڕماندن 3 (کتێب) دڕاوی 4 (جل‌وبەرگ) شڕی، کۆنی، تان‌دەرکەوتوویی ◌ 1 خرابی 2 خراب‌سازی 3 پارگی 4 مندرس بودن
**dilatability** /daɪˌleɪtəˈbɪlətɪ/ *noun*
لەکشان‌هاتوویی ◌ انبساط‌پذیری
**dilatable** /daɪˈleɪtəbl/ *adjective*
لەکشان‌هاتوو، دەکشێ ◌ انبساط‌پذیر
**dilatation** /ˌdaɪləˈteɪʃn, US ˌdɪlə-, ˌdaɪleɪ-/ = dilation
**dilated** *adjective*
گەورەوەبوو، کراوە، زلەوەبوو، کشاو، فشەوەبوو ◌ گشاد، باز
**dilation** /daɪˈleɪʃn/ *noun*
1 کشان، کرانەوە، گەورەبوونەوە، هەراوبوونەوە، زل‌بوونەوە، فش‌بوونەوە، فراوانی، ماسین، dilatation ،expansion: *The doctor checked his eyes but there was no abnormal pupil -on* 2 درێژدادری، زۆربێژی، درێژدری ◌ 1 اتساع، گشادی، آماس 2 درازگویی
**dilatometer** *noun*
کشان‌پێو ◌ گسترش‌سنج
**dilator** /daɪˈleɪtə(r)/ *noun*
1 (هەروەها dilator muscle) ماسوولکەی کشێنەر 2 کشێنەر، ئامێری هەراوکردنەوە (هی نەشتەرگەری) 3 دەرمانی رەگەکشێ ◌ 1 ماهیچه‌ی انبساط‌دهنده 2 انبساط‌دهنده،

ابزارگشادسازی 3 داروی وازودیلاتوری
**dilatorily** /ˌdɪləˈtɔrəli, US -ˈtɔːrəli/ *adverb*
بە خاوی، بە ساوەساو، بە شێنەیی ◌ بە کندی
**dilatoriness** /ˈdɪlətərinəs, US -tɔːrinəs/ *noun*
خاوی، هێواشی، شێنەیی‌بوون، سستی ◌ کندی
**dilatory** /ˈdɪlətəri, US -tɔːri/ *adjective*
1 خاو، خاووخلیچک، هێواش، شێنەیی، سست، تەپلوس: *dilatory tactics* 2 بەدرەنگ‌خەر: *dilatory tactics* ◌ 1 کند 2 مسبب تأخیر
**dildo** /ˈdɪldəʊ, US -doʊ/ *noun, pl.* dildos or dildoes
چووکی دەسکرد (ژنان بۆ خۆئاسوودەکردن لە خۆیانی دەخەن) ◌ دیلدو
**dilemma** /dɪˈlemə, US daɪ- *noun, pl.* dilemms
1 دوڕیانە، بارودۆخی ئاستەم، چەڵەمە، تەنگ‌وچەڵەمە، کێشە، گیروکێشە، گرفت، ئاستەنگ، تەنگانە؛ بارودۆخی ئاستەم، هەڵومەرجی دژوار، ڕەوش یان کاودانی ئاستەم: *to face a dilemma* 2 (لۆژیک) دیلێما، دەلیما (*dilemmatic adj*) ◌ 1 دوراهی، مشکل؛ وضعیت دشوار 2 قیاس یا برهان ذوحدین
**dilettante** /ˌdɪləˈtænti/ *noun, pl.* dilettanti /-ti/ or dilettantes
هونەردۆست (کەسێ کە زۆر سەرنج ناداتە شتێ و بۆ خۆشی دەیکا؛ بنەڕەت: لە ئیتالیاییەوە "کەسێ کە حەز لە هونەرەکان دەکا") ◌ متفنن
**dilettantish** *adjective*
هونەردۆست، سەرسەرەکی ◌ متفنن، سطحی
**dilettantism** *noun*
هونەردۆستی ◌ تفنن
**diligence**[1] /ˈdɪlɪdʒəns/ *noun*
حەوڵ، تێکۆشان، زەحمەت، خەبات، ڕەنج، کردوکۆش، بەکاری، شێلگیری، ڕشتی، سووربوون ◌ مجاهدت، جدیت، سعی
**diligence**[2] /ˈdɪlɪdʒəns/ *noun*
(مێژوویی) جۆرێ stagecoachی گشتی ◌ نوعی دلیجان عمومی
**diligent** /ˈdɪlɪdʒənt/ *adjective*
1 ڕەنج‌کێش، زەحمەت‌کێش، بەکار، بەحەوڵ، تێکۆشەر، کۆشا، نەحەساوە، نەسرەوتوو، شێلگیر، ڕشت، سوور: *a diligent* ◊ *a diligent worker* 2 یەکبینە، بەردەوام، لەسەرڕۆیشتوو *student* ◌ 1 سخت‌کوش، ساعی 2 مستمر
**diligently** /ˈdɪlɪdʒəntli/ *adverb*
1 بە تێکۆشانەوە، شێلگیرانە 2 یەکبینە، لەسەریەک، یەک‌وچان ◌ 1 با کوشش، با جدیت 2 مرتب
**dill**[1] /dɪl/ *noun,* also dill weed
(ڕووەکناسی) شوێت، شوید [ *Anethum graveolens*] ◌ شوید
**dill**[2] /dɪl/ *noun*
(تافەرمی، ئەوستڕالیا) مرۆی گەوج ◌ آدم احمق
**dill pickle** *noun*
خەیاری ترشیات (شوێتی تێکراوە) ◌ خیار ترشی
**dill water** *noun*
شوێتاو، ئاوی شوید یان شوێت ◌ آب شوید
**dilly**[1] *noun, pl.* dillies
(تافەرمی) شتێ هەرەباش یان دەرکەوتوو، شتێ بەرچاو (گۆڕاوی برگەی سەرەتای delightful یان delicious) ◌ (عامیانه) چیز بارز
**dilly**[2] *adjective* (dillier, dilliest)
(تافەرمی، ئەوستڕالیا و نیوزیلەند) گەوج، سەیر ◌ احمق، عجیب
**dillybag** *noun*
جۆرێ سەوەتەی سەرەتانشینانی ئەوستڕالیا، لە گیا یا ریشالی چنراو دروست دەکرێ، ریشالینە ◌ دیلیبگ
**dilophosaurus** /daɪˌləʊfə(ʊ)ˈsɔːrəs/ *noun*
(مار)مێلکەدووپۆپنە: جۆرێ دایناسۆری گەورەی دووپێی سەرەتای قۆناخی ژووراسیک، دووپۆپەی دریژی لەسەری (بنەڕەت: لە یۆنانییەوە *dilophos* "دووپۆپنە" + *sauros* "مارمێلک") ◌ نوعی دایناسور
**diluent** /ˈdɪljʊənt/ *noun, adjective*
*n* ماک یان مەتریالی ڕوونکەرەوە یان تەنکێنەر *adj* تراوکەر، ڕوونکەرەوە، تراوێنەر، تەنکێنەر ◌ *n* مادەی رقیق‌کنندە *adj* رقیق‌کنندە
**dilute** /daɪˈluːt, US -ˈljuːt/ *adjective*
1 تراو، تەنک، ڕوون، ئاوەکی 2 (کیمیا، گیراوەیی) تراو، تەنک: ئاستی خەستی یان پەیێی solute ی (تا ڕادەیێ) کەمە: *a dilute acid* ◌ رقیق
**dilution** /daɪˈluːʃn, US -ˈljuːʃn/ *noun*
1 تراوکردن، تراواندن، تەنک‌کردن، تەنکاندن، ڕوونکردنەوە، تراوی: *the dilution of sewage* 2 لاوازکردن، سست‌کردن، سستاندن، لاوازاندن، نزم‌کردنەوە ◌ 1 رقیق‌سازی، رقت 2 تضعیف
**dilutor** *noun,* also diluter
تراوێنەر، تەنکێنەر، ڕوونکەرەوە ◌ رقیق‌ساز
**diluvial** /daɪˈl(j)uːvɪəl, US dɪ-/ *noun,* also diluvian
سەربە سێلاو یان لافاو، ب.ت. لافاوەکەی نووح ◌ وابسته به توفان، به ویژه توفان نوح
**dim** /dɪm/ *adjective* (dimmer, dimmest)
1 تاریک، تار، بێ‌شەوق، بێ‌ڕووناکی، بێ‌ڕۆشنایی 2 (شەوق) کز، کەم 3 (چاو) کەم‌سۆما، کز، لێڵ، چاک‌نەدیتوو 4 لێڵ، ڕوون نییە، نامەعلووم، نادیار، تەماوی 5 گێژ، کەم‌هۆش، گەمژە، حەپە ◌ 1 تیره 2 (نور) ضعیف 3 (چشم) کم‌سو 4 نامعلوم، مبهم 5 خنگ

**dime** /daɪm/ *noun*
1 (لە ئەمریکا و کەنەدا) دەسێنتی 2 شایی، پەنابات ۞ 1 دەستی 2 پشیز

**dimenhydrinate** *noun*
دایمێنهایدرینات: جۆری antihistamine کریستالی $C_{24}H_{28}ClN_5O_3$، بۆ بەرگیری یان پێشگیری لە nausea بەکاردێنرێ ۞ دیمن‌هیدرینات

**dime novel** *noun*
(لە ئەمریکا) رۆمانی دەسێنتی یان هەرزان ۞ رمان دەستی

**dimension** /daɪˈmenʃn, US dɪ-/ *noun*
1 رەهەند، دووری، ئەندازە 2 (خوازە) رەهەند، لایەن، ئالی 3 (dimensions) بەرینایی، بەربلاوی، فراوانی، بەرفرەهی، گەورەیی (-dimensionality *n* ؛dimensional *adj* ؛dimensionless *adj*) ۞ 1 بعد 2 (مجازی) جنبه 3 (در جمع) وسعت

**dimensional** /daɪˈmenʃənl, dɪ-/ *adjective*
رەهەندی، سەربە دووری، سەربە ئەندازە (dimensionally *adv*) ۞ بعدی

**dimer** /ˈdʌɪmə/ *noun*
دووپار(ژە)، دووپاریژە، جووت‌پار، دووپارچە (dimeric *adj*: دووپار(ژە)ی، دووپارچەیی، سەربە دووپارژە؛ dimerism *n*: دووپار(ژە)یی، دووپارچەیی) ۞ دوپار، دیمر

**dimerization** *noun*
(کیمیا) دووپاراندن، دووپارژاندن، دووپارچاندن ۞ دیمریزاسیون

**dimerous** /ˈdɪm(ə)rəs/ *adjective*
(گیانەوەرناسی و رووەکناسی) دووبەشی، جووت‌بەشی، دووبەشە، جووت‌بەشە، پێکهاتوو یان دابەش‌بوو بەسەر دوو بەش‌دا ۞ دوجزئی

**dime store** *noun*
1 دووکانی شت‌ومەکی هەرزان‌بایی 2 (وەکوو ئاوەڵناو) هەرزان و خراپ، inferior ،cheap ۞ 1 مغازەی ارزان‌فروشی 2 ارزان و نامرغوب

**dimeter** /ˈdɪmɪtə/ *noun*
هۆنراوە یان شیعرێکی دووکێشی یان دووپایەیی، دووڕەوتە ۞ دیمتر

**dimethoate** *noun*
مێرووکوژ insecticide یا کرمکوژێکی organophosphorous miticide $C_5H_{12}NO_3PS_2$، بۆ بەروبوو و رووەکی جوانی بەکاردێنرێ ۞ دیمتوات

**dimethyl** = ethane (often used in combination)

**dimethylhydrazine** *noun*
هەریەک لە دوو شلەی ئیزۆمێریکی گڕکێش $C_2H_8N_2$ ۞ دیمتیل هیدرازین

**dimethylnitrosamine** *noun, abbreviation* DMN , DMNA
دایمیتایل نیترۆسامین: نیترۆسامینی $C_2H_6N_2O$ carcinogenic، ب.ت. لە دووکەڵی تووتن و هێندێ خواردەمەنی دایە ۞ دیمتیل نیتروسامین

**dimethyl sulphoxide** /dʌɪˌmiːθʌɪl sʌlˈfɒksʌɪd, -ˌmɛθ-, -θɪl/ *noun*, US dimethyl sulfoxide, also DMSO
دایمیتایل سۆلفۆکساید: ئاوێتەیێکی بێ‌ڕەنگ $C_2H_6SO$، وەک توێنەر لە پزشکی‌دا بەکاردێنرێ ۞ دیمتیل سولفوکسید

**dimethyltryptamine** *noun*, also DMT
دایمیتایل تریپتامین، دیمیتیل تریپتامین: دەرمانێکی hallucinogenic ئاسان‌پێکهێنراو $C_{12}H_{16}N_2$ ۞ دیمتیل تریپتامین

**dimetrodon** /dʌɪˈmiːtrədɒn/ *noun*
دووددانەدرێژە: جۆرێ گیانەوەری بووبەردی carnivorous خشۆکی گۆشت‌خۆری fossil کەتەی قۆناخی Permian ۞ دیمترودون

**dimin.** *abbreviation* 1 diminish2 diminuendo 3 diminutive

**diminishable** /dɪˈmɪnɪʃəbl/ *adjective*
شیاوی کەم‌بوونەوە، کەم دەبێتەوە، دادەشکێ ۞ قابل کاهش

**diminished** *adjective*
1 کەمەوەبوو، دابەزیو، داشکاو، کزبوو 2 (موسیقا) کەم: *a diminished fifth* ۞ 1 کاهش‌یافته 2 (موسیقی) کاسته

**diminished responsibility** *noun*, also diminished capacity
(بریتانیا و ماف) ناساغی، شێتی، بەرپرسایەتی داشکاو یا کەمەوەبوو، (کەسێ کە تووشی تاوانێ دەبێ، بەڵام لەبەر ساغ‌نەبوونی ناتوانرێ تاوانەکە بەسەری‌دا ساغ بێتەوە) ۞ عدم سلامت روانی

**diminishing** *adjective*
کەمەوەبوو، رووله داشکان، رووله کەمی، رووله دابەزین ۞ کاهش‌یابنده

**diminishing returns** *noun*
بەهەرە و داهاتی کەم سەبارەت بە زیادبوونی سەرمایە ۞ دیمینیشینگ رتورنس

**diminuendo** /dɪˌmɪnjuˈendəʊ, US -doʊ/ *noun, adjective, adverb*
(موسیقا) کەم‌بوونەوە یان هێواش‌بوونەوەی بەرەبەرەی دەنگ، هەروەها decrescendo ۞ دیمینوایندو

**diminution** /ˌdɪmɪˈnjuːʃn, US -ˈnuːʃn/ *noun*
1 کەم‌بوونەوە، هاتنەخوارەوە، دابەزین، داشکان، decrease ،reduction 2 چکۆلاندن، پچووکاندن ۞ 1 کاهش 2 تصغیر

**diminutive** /dɪˈmɪnjətɪv/ *adjective, noun*

*adj* 1 ورد، چکۆلە، چکۆلانە، پچوک، بچوک، گچکە، وردیلانە 2 (ڕێزمان) سەربە چکۆلاندن، پچوککراو، پچوککەرەبر، ئاماژە دەکا بە چکۆلەبوونەوە *n* (ڕێزمان) وشەی چکۆلێنراو یان پچوککراو (diminutively *adv*) ۞ 1 *adj* خرد، کوچک 2 (دستور زبان) تصغیری *n* (دستور زبان) مصغر

**diminutive suffix** *noun*
پاشگری چکۆلاندن یان پچوکاندن یان پچوککردن ۞ پسوند تصغیر

**dimissory** /'dɪmɪs(ə)ri/ *adjective*
(لە کلێسەی کریستانیەتدا) ودمپێدراو؟ (- ئاماژە بە دەستوور یان ڕێگەدانی فەرمی گەورەقەشە بە کەسێ لە diocese ـێکەوە بۆ دانەیێکی تر) ۞ دیمیسری

**dimity** /'dɪmɪti/ *nounm pl.* dimities
دیمیتی (- جۆرێ پارچەی کەتانی ئەستووری نەخش شەترەنجی یان ڕێڕێ) ۞ دمیاطی

**dimly** /'dɪmli/ *adverb*
تاریکانە، بە شێوەیێکی تاریک یان تەماوی: *I did remember, but only dimly* ◊ *a dimly lit room* ۞ به طور تیره یا مبهم

**dimmer** *noun,* also dimmer switch
کلیلی گۆڕین (یان میزانکردن)ی تیژی ڕووناکی (یان شەوق) ۞ دیمر

**dimness** /dɪmnəs/ *noun*
تاریکی، تاری، تەماویبوون، لێلی، ناڕوونی، کەمشەوقی، کزی ۞ تیرگی. ابهام، کم‌نوری

**dimorphic** /dʌɪ'mɔːfɪk/ *adjective,* also dimorphous /dʌɪ'mɔːfəs/
دووشێوە، دووبیچم، جووتشێوە، جووتبیچم: *sexually dimorphic* ◊ *dimorphic leaves* ◊ *coloration in birds* ۞ دوریخت

**dimorphism** /dʌɪ'mɔːfɪzm *noun*
دووشێوەیی، دووبیچمی، جووتشێوەیی ۞ دوریختی

**dimple** /'dɪmpl/ *noun*
1 (گوپ، چەناگە) چاڵ، کۆرت، قولکە؛ چاڵی سەر ئاستێ (وەک هی تۆپی گۆلف) 2 (ئاو و هتد) قەلبەزە، شەپۆل (dimply *adj*) ۞ 1 چال 2 موج

**dimpled** /'dɪmpld/ *adjective*
1 قولکاوی، چاڵ، بەچاڵداکەوتوو، چاڵچاڵ، چاڵدار، بەچاڵ: *a dimpled chin* 2 شەپۆلاوی ۞ 1 دارای چال 2 دارای موج

**dim sum** /dɪm 'sʌm/ *noun,* also dim sim /'sɪm/
جۆرێ چێشتی چینی ۞ نوعی غذای چینی

**dimwit** *noun*
(نافەرمی) مرۆی گەوج، کەر، گوێلک، silly ۞ (عامیانه) آدم احمق

**dimwitted** *adjective*
گەوج، کەر (dimwittedly *adv*؛ dimwittedness *n*) ۞ احمق

**din** /dɪn/ *noun*
قاڵەقاڵم، هەرا، دەنگوهەرا، دەنگەدەنگ، قاووقیژ، هەراوهوریا (dynn ،dyne ئینگلیسی کۆن، ئەڵمانی بنەڕەت) ۞ داد و قال

**DIN** *abbreviation* Deusche Industrei-Norm
ستاندارد یان پێودانگی پیشەسازی ئەڵمانیا ۞ معیار صنعتی آلمان

**dinar**[1] /'diːnɑː(r)/ *noun*
یەکەی بنەڕەتی پارە لە یۆگۆسلافیا، بەرامبەر بە سەد para ۞ دینار

**dinar**[2] /'diːnɑː(r)/ *noun*
1 یەکەی بنەڕەتی پارەی چەندین وڵاتی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و باکووری ئەفریکا، بەرامبەر بە هەزار fils لە ئۆردون، ئێراق و بەحرەین 2 هەزار dirham لە لیبیا 3 سەد centime لە ئەلجەزایر، و دە pound لە سوودان ۞ دینار

**diner** /'daɪnə(r)/ *noun*
1 ژەمی نیوەڕۆ یان شێو دەخوا 2 مشتەری (خواردنگە) 3 خواردنگە یان ڕێستورانی هەرزان، خواردنگەی چکۆلانە (ب.ت. لەپاڵ ڕێگە): *a roadside diner* 4 (شەمەندەفەر) واگۆنی خواردنگە ۞ 1 نهار یا شام‌خورنده 2 مشتری 3 رستوران کوچک 4 واگن رستوران

**dinero** /dɪ'nɛːrəʊ/ *noun*
(نافەرمی، ئەمریکا(ی باکووری) پارە، پوول، کۆین (سپانیایی) ۞ پول، سکه

**dinette** /dʌɪ'nɛt/ *noun*
1 دیوێکی چکۆلە یا بەشێ لە دیوێ بۆ نانخواردن 2 میز و کورسی جێگایێکی وا ۞ دینت

**ding** /dɪŋ/ *noun*
1 لێدان (لە سەر) 2 زرینگە، دەنگی زەنگ ۞ 1 ضربت 2 دنگ

**ding-a-ling** *noun,* also dingbat
1 (ئەمریکا) مرۆی کەر، بنیادەمی گەوج 2 زرنگە ۞ 1 آدم احمق 2 دنگ

**ding-dong** /'dɪŋ dɒŋ, US dɑːŋ, dɔːŋ/ *noun*
1 زرینگەزرینگ، دەنگەدەنگی زەنگ 2 شەڕەچەلەحانێ، مشتومڕ، دمەدمە 3 مرۆی گەوج ۞ 1 دنگ‌دنگ 2 مشاجره 3 آدم احمق

**dinghy** /'dɪŋi, US 'dɪŋgi/ *noun, pl.* dinghies
1 گەمی، بەلەم، لۆتکە 2 گەمی بایی جیری ۞ 1 قایق 2 قایق بادی

**dingle** /dɪŋgl/ *noun*
(وێژەیی) شیوی پڕدار، سەوزەدۆڵ، سەوز(ە)دەرە ۞ سبزدره

**dingo** /'dɪŋgəʊ, US -goʊ/ *noun, pl.*

dingoes or dingos
1 دینگــۆ: ســەگی دڕ و کێــوی ئەوســترالیایی 2 (ئەوســترالیا) مــرۆی ناپــاک یــان ترســەنۆک، خوێڕی‌یەپیاو ◌ 1 دینگو 2 آدم خائن یا ترسو
**dingy** /'dɪndʒi/ *adjective* (dingier, dingiest)
تاریــک، نــاخۆش، خەفــە، دڵــتەنگ، پــیس، ناخاوێن، چڵکن (*adv* dingily: بە شێوەیەکی خەفە، دڵتەنگانە؛ *n* dingíness: 1 خەفەبوون، تاریکی، دڵتەنگی، ناخۆشی 2 پیسی، چڵکنی) ◌ گرفته، خفه، کثیف
**dining car** /'daɪnɪŋ kɑ:(r)/ *noun*
(شەمەندەفەر) واگۆنی خواردنگە یا نانخواردن ◌ واگن رستوران
**dining room** /'daɪnɪŋ ru:m/ *noun*
دیــوی نــانخــواردن، ژووری نــەهارخۆری، سفرەخانە، خوانخانە ◌ اتاق غذاخوری
**dining table** *noun*
مێزی نانخــواردن، مێزی نەهارخۆری ◌ میــز غذاخوری
**dinitrobenzene** *noun*
هەرێەک لە سێ بەرهەمی بێنزین بە شێوگی $C_6H_4(NO_2)_2$ ◌ دینیتروبنزن
**dinitrophenol** *noun*
هــەرێــەک لــە شــەش ئاوێتــەی کریــستاڵی ئیزۆمێریــــک $C_6H_4N_2O_5$، هێنــــدێ لــــە بەرهەمەکانی وەک مێرووکوژ pesticide وان ◌ دینیترفنول
**Dinka** /'dɪŋkə/ *noun, pl.* same or Dinkas
1 ئەندامی گەلی سوودانی گۆلکاوەکانی نیل 2 زمانی Niliticی ئەو گەلە (لە *Jieng* وشەیێکی خۆماڵی بە واتای "گەل people") ◌ دینکا
**dinkum** /'dɪŋkəm/ *adjective, adverb,* also fair dinkum
*adj* (نافەرمی) راستەقینە، راست، رەسەن، واقعی *adv* (زۆرتر لە پرسیاردا) بە راست(ی) ◌ *adj* اصیل، حقیقی *adv* واقعاً
**dinky** /'dɪŋki/ *adjective* (dinkier, dinkiest)
1 چکۆلە و جوان، قوتو، خشپلانە 2 (لە ئەمریکا) هیچ، هیچەکە ◌ 1 نقلی 2 (در امریکا) جزئی
**dinky-di** /ˌdɪŋkɪ'dʌɪ/ = dinkum
**dinner** /'dɪnə(r)/ *noun*
1 فراوێن، نەهار، نافرۆژ، نانی نیوەڕۆ 2 شێو، نانی ئێوارە 3 نان، خۆراک 4 میوانی شێوان ◌ 1 ناهار 2 شام 3 غذا 4 ضیافت، مهمانی
**dinner dance** *noun*
میوانی شێوان و هەڵپەڕکێ ◌ ضیافت شام و رقص
**dinner jacket** *noun,* also dinner coat
کەوا یان جلی فەرمی (ب.ت. رەش) ◌ ژاکت یا لباس رسمی
**dinner party** *noun*
میــوانی شــێو، میــوانی شــێوان، بــەزمی شــەو ◌ مهمانی شام
**dinner service** *noun,* also dinner set
سێرڤیسی نانخــواردن، دەستەقاپی نانخــواردن ◌ سرویس غذاخوری
**dinner suit** *noun*
جلی فەرمی، بەرگی میوانی ◌ لباس رسمی
**dinner table** *noun*
مێزی نانخواردن ◌ میز غذاخوری
**dinner theatre** *noun*
تیاتری دوای نانخواردن ◌ تئاتر بعد از غذا
**dinnertime** *noun*
1 کاتی نانخواردن، چێشتەنگاو 2 وەختی نەهار یان نیوەڕوان، فراوێن 3 وەختی شێو، شێوان ◌ 1 وقت غذا 2 وقت ناهار 3 وقت شام
**dinner wagon** *noun*
واگۆنی نانخواردن ◌ واگون غذاخوری
**dinnerware** /'dɪnəweə(r), US 'dɪnərwer/ *noun*
قاپوقاچاغی نانخواردن ◌ ظروف غذاخوری
**dino** (*pl.* dinos) = dinosaur
**dinoceras** *noun*
دینۆسێراس (= گیانەوەرێکی زلەی قرتێکەتوو) ◌ دینوسراس
**dinoflagellate** /ˌdʌɪnə(ʊ)'fladʒəleɪt/ *noun*
(زیندەناسی) دووشێلاقە: زینــدەوەرێکی ئــاوی یەکخانەیی دووشێلاقە، بە ژمارەیێکی یەکجار زۆر لە سەراوەکی plankton دەریاییدا هەیە [دیڤیژن: Dinophyta] ◌ داینوفلاگلات
**dinosaur** /'daɪnəsɔ:(r)/ *noun*
1 دایناســۆر، دێو(مار)مێلکە (جۆرێ خشۆکی بووبەردی یان فوسیلی Mesozoic ی کۆمەڵێ جۆراوجۆری جووتپێ یان چوار پێ، وەک tyrannosaurus، brachiosaurus، triceratops و هتد (*adj* dinosaurian: لە لاتینی *dinosaurus* و ئەویش لە یۆنانییەوە: *deinos* "terrible" + *sauros* "lizard") 2 کەس یــان شــتێکی کــۆن و لەباوکــەوتوو (چونکــو نەیتوانیوە خۆی بگونجێنێ) ◌ 1 دایناسور 2 آدم یا چیز قدیمی
**dinothere** *noun*
دینۆســێر (جــۆرێ گیانــەوەری گــواندار قرتێکەوتووی فیلئاسا، هی دوایی‌یەکانی Tertiary [تۆخم *Deinotherium*]) ◌ دینوتر
**dint** /dɪnt/ *noun,* by dint of
1 قوڵکە، قوپاوی، چاڵ 2 بە، بە یارمەتی، بە ئالیکاری، بەهۆی، لە سایەی، بە زەبری (*adj* dintless) ◌ 1 گودی 2 به وسیله‌ی
**dinucleotide** *noun*
nucleotideێ کە لە دوو یەکە پێکهاتوو کە هەرێەکیان لە فۆسفات، پێنتۆزێ و بنەڕەتی نایترۆژێنی پێکهاتوون ◌ دینوکلئوتید

**diocesan** /daɪˈɒsɪsn, US -ˈɑːs-/ *adjective, noun*
*adj* سەرقەشـــەیی، گەورەقەشـــەیی، ســـەربە مەڵـــبەندی (ژێـــر دەســـەڵاتی) سەرقەشـــە *n* سەرقەشەی مەڵبەندێ ◯ *adj* اسقفی، وابسته به قلمرو اسقف *n* اسقف قلمروی

**diocese** /ˈdaɪəsɪs/ *noun, pl.* dioceses /ˈdʌɪəsiːz, -siːzɪz/
مەڵـــبەندی (ژێـــر دەســـەڵاتی) سەرقەشـــە یـــان ئوسقوف، سەرقەشەنشین ◯ قلمرو اسقف

**diode** /ˈdaɪəʊd, US -oʊd/ *noun, adjective*
دیۆد، دایۆد، دووئێلیکترۆد ◯ دیود

**dioecious** /dʌɪˈiːʃəs/ *adjective*
(زیندەناسی، رووەک یا گیانەوەر بێبڕبڕەکان) دووخانک، دوومالـە: خـاوەنی ئەندامی زاوزێی نێرینە و مێیینە بەجیا ◯ دیوسیوس

**dioestrus** /dʌɪˈiːstrəs/ *noun,* US diestrus
(گیانەوەرناسـی، زۆربـەی گـوانداره مێیـەکان) قۆنـاخی ناچـالاکی سێکـسـی نێـوان قۆناخـە دووپارەبووەکانی oestrus دا ◯ دیوستروس

**diol** /ˈdʌɪɒl/ *noun*
ئەلکۆلـێـن کـە دوو کۆمەڵـی hydroxylی لـە گەردەکەیا تیایە ◯ دیول

**Diomedes** *noun,* Latin, from Greek *Diomēdēs*
دیۆمێدیس، دیۆمێدیز: یەکێ لە پاڵەوانانی یۆنانی لە شەڕی ترۆیدا Trojan ◯ دیومدس

**Dionydsia** *noun,* Latin, from Greek, from *Dionysos*
دیۆنیـسیا، جـەژنی دیۆنیـسی: جـەژنێکـی کـۆنی یۆنـانییـەکـان کـە بـە ســەربـەرزی Dionysus دەگیرا ◯ دیونیسیا

**Dionysiac** /ˌdʌɪəˈnɪzɪak/ *adjective,* also Dionysian /-zɪən/
1 دیۆنیسیاک، دایئێنیزیاک (سەربە یان پێوەندی بـە خـودا Dionysus هـەیـە، لـە میـسۆلۆژی یۆنـانیدا) 2 ســەربــە لایــەنــە هــەســتی و ســۆزەکـییـەکـانی سروشـتی مـرۆڤ (بڕوانـە Apollonian) ◯ دیونیسیاک

**Dionysus** *noun,* also Diony, Latin, from Greek *Dionysos*
دایـۆنیزۆس، دیـۆنیزۆس (= خـودای مـەی لـە میسۆلۆژی یۆنانیدا) ◯ دیونیزوس

**Diophantine equation** /ˌdʌɪəˈfantɪn, -tʌɪn/ *noun*
هاوکێشەی دیۆفـانتین (لـە نـاوی ریـازیزانی یۆنـانی ســەدەی ســێهەمــی پــاش زایــین *Diophantus*) ◯ معادلەی دیوفانتین

**diopside** /dʌɪˈɒpsʌɪd/ *noun*
دایۆپـسـاید، دیۆپسید: جـۆرێ کـانی پیرۆکـسـینی monoclinic رەنگـــاورەنـــگ، ســـیلیکاتی مەنیزیۆمی ئالومینیۆمی تیایە $CaMg(SiO_3)_2$، ب.ت. لـە نێـو کریـستاڵ و بـەردە گرکـانی و گـۆڕاوەکـان metamorphic دایـە ( diopsidic *adj*: سەربە دایۆپساید، دیۆپسید) ◯ دیوپسید

**dioptase** *noun*
دایۆپتاز، دیۆپتاز: کانێکی سیلیکاتی مسی ئاودار $CuSiO_3.H_2O$، لە نێو کریستاڵە رەنگ‌سەوز کاڵەکاندا هەیە ◯ دیوپتاز

**dioptometer** *noun*
شکانەوەپێو (چاو) ◯ دیوپتومتر

**dioptre** /daɪˈɒptə(r), US -ˈɑːp-/ *noun,* US diopter, *abbreviation* D.
دیۆپتێر (یەکەی پێوانی هێزی هاوێنە) ◯ دیوپتر

**dioptric** /daɪˈɒptrɪk, US -ˈɑːp-/ *adjective*
ســەربە شـکانەوەی رووناکی، شـکانەوەیی ◯ وابسته به شکست نور

**dioptrics** /daɪˈɒptrɪks, US -ˈɑːp-/ *noun, pl.*
شکانەوەناسی، زانستی شکانەوەی رووناکی ◯ علم شکست نور

**diorama** /ˌdʌɪəˈrɑːmə/ *noun, pl.* dioramas
وێنەی گۆڕاو(گۆڕ؛ dioramic *adj*) ◯ شهر فرنگ

**diorite** /ˈdʌɪərʌɪt/ *noun*
(زەویناسـی) دایۆرایـت، دیۆریـت، دیۆرایـت، دایۆریت: جۆرێ بەردی گرکانی کونج‌کونج و دەنـک‌زبـر یـان دەنـک‌درشـت، زۆرتـر لـە plagioclase، feldspar و hornblende پێکهاتووە ◯ دیوریت

**dioritic** *adjective*
سەربە دایۆرایت یا دیۆریت ◯ وابسته به دیوریت

**Dioscuri** *noun,* New Latin, from Greek *Dioskouroi*
دیۆسـکیۆری، کـورەکـانی زیـۆس: دوو بـرای دووانە "کاستۆر" Castor و "پۆلۆکس" Pollux کە دوای مەرگی کاستۆر لە لایەن زیۆسەوە بڕیار درا رۆژێ لـەسـەر عـەرز و رۆژێ لـە جیهـانی مردووان بژین ◯ دیوسکیوری

**dioxane** /dʌɪˈɒkseɪn/ *noun,* also dioxan /-an/
(کیمیـا) دوانۆکـســەین، دیئۆکــســەین $C_4H_8O_2$: ئاوێتەیێکی جیابازنەیی زاراوی بێڕەنگ، وەک توێنەرێکی ئەندامی بەکاردێترێ ◯ دیوکسان

**dioxide** /daɪˈɒksaɪd, US -ˈɑːks-/ *noun*
دوانۆکـــساید، دیئۆکــسید، دیئۆکـــساید ◯ دی‌اکسید

**dioxin** /daɪˈɒksɪn, US -ˈɑːks-/ *noun*
دایاکساین، دایۆکساین، دایۆکسین (مەتریالێکی کیمیایی یەکجار ژاراوییە، لە بواری پیشەسازی و کشت‌وکاڵدا بەکاردێترێ) ◯ دیوکسین

**dip** /dɪp/ *noun*
1 تـــێ‌هەڵکێـــشان، وەردان، تـــێ‌خـــستن 2

سووکەمەلێ، مەلە، مەلێی پشیلەشۆرانە 3 سەرەوخواری، لێژ 4 کەمبوونەوە، داخزان، داشکان، نزمبوونەوە، هاتنەخوارەوە: *a sharp dip in profits* 5 سۆس 6 گیراوەی خاوێنکردنەوەی مەڕ 7 (ئافەرمی، ئەمریکا) کەسێکی گەوج 8 (ئالا) خوارەوەهاتوویی، هاتنەخوارەوە، داگیراوی ۞ 1 عمل فروکردن 2 آبتنی 3 شیب 4 افت 5 سس 6 دیپ 7 آدم احمق 8 پایینآمدگی

**Dip** *abbreviation* diploma

**dipetalous** /daɪ'petləs/ *adjective*
دووپەڕە(یی)، جووتپەڕە، خاوەنی دووپەڕە ۞ دارای دو گلبرگ

**diphosgene** *noun*
دیفوسژین (گازێکی ژاراوی) ۞ دیفوسژن

**diphtheria** /dɪf'θɪəriə, -'θɪriə, 'dɪp-/ *noun*
دووشاخە، تاس، پێران، وەناق، بەهۆی بەکتریایێکی gram-positive (*Corynebacterium diphtheriae*) تووش دەبێ کە ژاری بەرهەم دێنێ (یان دەردەدا) کە دەبێتە هۆی ئاوسانی دڵ و nervous system (diphtheroid ،diphtheritic /-θɔ'rɪtɪk/ *adj*) (*adj* ۞ دیفتری، خناق

**diphtherial** *adjective*
دووشاخەیی، سەربە تاس، وەناقی ۞ وابستە بە دیفتری، خناقی

**diphthong** /'dɪfθɒŋ, 'dɪp-, US -θɔːŋ/ *noun*
بزوێنی لێکدراو، دوولۆ، دووبزوێنە (لە دەنگدا ب.ت. /*paɪp*/ pipe، لە پیتەکاندا وەکوو *ou* لە (doubt ۞ واکەی مرکب

**diphthongal** /-'θɒŋg(ə)l/ *adjective*
سەربە بزوێنی لێکدراو، دووبزوێنەیی ۞ وابستە بە واکەی مرکب

**diphthongization** /ˌdɪfθɒŋaɪ'zeɪʃn, US -θɔːŋ-, ˌdɪp-/ *noun*
تێکهەڵکێشان یان لێکدانی دەنگەکان، بوونەدووبزوێنە ۞ ادغام اصوات، دوواکەشدگی

**diphyllous** *adjective*
دووگەڵایی، جووتگەڵایی ۞ دوبرگە

**diplo-** *prefix*
پێشگر: 1 جووت، دوانە، دووانە، دووئەوندە، 2 *diplococcus* : دووچەندانە، دووبەرامبەر: *diplotene* دیپلۆنید: (لە *diplous* یۆنانییەوە "double") ۞ پیشوند: 1 دوگانە، حفت، دوبرابر، مضاعف 2 دیپلوئید

**diplodocus** /dɪ'plɒdəkəs, US ˌdɪplə(ʊ)'dəʊkəs/ *noun*
جۆرێ دایناسۆری زلەی گیاخۆری دوایی‌یەکانی قۆناخی Jurrasic بە مل و کلکی باریک و درێژەوە ۞ نوعی دایناسور

**diploid** /'dɪplɔɪd/ *adjective*
1 دووبەرامبەر، دووئەوندە، دوولۆ 2 (بۆماوەناسی، خانە یان ناوکێ) خاوەنی دوو کۆمەڵەی تەواوی کرۆموزۆمەکان: *diploid somatic cells* (بڕوانە haploid) ۞ 1 دوبرابر، دولا 2 دیپلوید

**diploidy** *noun*
دیپلۆ(ئ)یدی ۞ دیپلوئیدی

**diploma** /dɪ'pləʊmə, US -'ploʊ-/ *noun*
1 دیپلۆم 2 ودم، بڕوانامەی خوێندن ۞ 1 دیپلم 2 مدرک تحصیلی

**diplomacy** /dɪ'pləʊməsi, US -'ploʊ-/ *noun*
دیپلۆماسی، دانوستان، هونەر (یان زانستی)ی دانوستان، چارەدۆزی، سیاسەتوانی، کارزانی، لێهاتوویی، رامیاری، سیاسەت: *international diplomacy* ۞ دیپلماسی، مذاکرە، سیاستپردازی

**diplomat** /'dɪpləmæt/ *noun*
1 دیپلۆمات، نوێنەری رامیاری یان سیاسی 2 مرۆی لێهاتوو یان زیرەک، مرۆی سیاسەتوان، مرۆی کارزان ۞ 1 دیپلمات 2 آدم باتدبیر

**diplomatic** /ˌdɪplə'mætɪk/ *adjective*
1 سەربە دیپلۆماسی، دیپلۆماتیک: *diplomatic relations* ◊ *a diplomatic crisis* 2 زیرەکانە، بەجێ، لێهاتووانە، ورد، سیاسەتوانانە، هەڵسەنگێنراو، لێکەوەدراو، کارزان، لێزان، شارەزا، بەتەگبیر، بەمشوور، بەسیاسەت ۞ 1 وابستە بە دیپلماسی 2 حسابشدە، سیاستمدارانە، باتدبیر

**diplomatically** /-kli/ *adverb*
بە شێوەیەکی هەڵسەنگێنراو، لێکدراوانە، زیرەکانە، سیاسی‌یانە، لێزانانە ۞ بە طور حسابشدە، مدبرانە

**diplomatic bag** *noun*, also diplomatic pouch
بارگەوبنەی دیپلۆماتیک، باری دیپلۆماتیک، توورەکەی دیپلۆماتیک ۞ محمولەی دیپلماتیک

**diplomatic corps** *noun*, also diplomatic body
دەستەی دیپلۆماتیک، دەستەی نوێنەرانی رامیاری یان سیاسی ۞ هیأت نمایندگان سیاسی

**diplomatic immunity** *noun*
پارێزرانی دیپلۆماتیک ۞ مصونیت سیاسی

**diplomatic relations** *noun, pl.*
پێوەندی‌یە دیپلۆماتیکی‌یەکان، پێوەندی‌یە سیاسی یان رامیاری‌یەکان ۞ روابط دیپلماتیک

**diplomatic service** *noun*
سێرڤیسی دیپلۆماتیک (سەرجەم ئەو کاربەدەستانەی کە دیپلۆماسی وڵاتێ بەڕێوەدەبەن) ۞ کادر سیاسی

**diplomatist** /dɪ'pləʊmətɪst, US -'ploʊ-/ = diplomat

**diplont** *noun*
1 دیپلۆنت: زیندەوەرێکی diploid کە لە سووڕێکی ژیاندا خاوەنی فاز یان قۆناخی دیپلۆئید و هاپلۆئیدە 2 زیندەوەری بە دوو دەستە کرۆمۆزۆم لە خانە لەشی‌یەکانیدا somatic cells و دەستە هاپلۆئیدیکی تاکی کرۆمۆزۆمەکان لە گامێتەکەیدا ◌ دیپلونت
**diplophase** *noun*
قۆناخی دیپلۆئید، دیپلۆفاز، قۆناخێ لە ژیانی خانە کە لەودا ژمارەی کرۆمۆزۆمەکان جووتن ◌ دیپلوفاز
**diplopia** /dɪ'pləʊpɪə/ = double vision (diplopic *adj*)
**diplopod** /'dɪpləpɒd/ *noun*
(گیانەوەری) جووت‌پێ، هەزارپێ ◌ دیپلوپود
**Diplopoda** /ˌdɪplə'pəʊdə/ *noun, pl.*
(گیانەوەرناسی) جووت‌پێیان، جووت‌پایان، هەزارپێیان (وەکوو هەزارپێیان) ◌ دیپلوپودا
**diplotene** /'dɪpləti:n/ *noun*
(زیندەناسی) جووت‌باریکە، جووت‌بەست: چوارەمین قۆناخی prophase کەمەدابەش‌بوون meiosis کە بە دوای pachytene دا دێ، بە درێژایی ئەمە کرۆمۆزۆمە جووتەکان لێک جیا دەبنەوە (بنەڕەت: لە -diplo + *tainia* یۆنانی "باریکە، بەست و... band") ◌ دیپلوتن
**dip net** *noun*
جۆرێ تۆڕی ڕاوەماسی چکۆلەی دەسک‌درێژ ◌ نوعی تور
**dipnoan** *adjective, noun*
جووت‌هەناسەیی، دووهەناسەیی (هەم بە سی و هەم بە شیپەڕە هەناسە (هەڵ)دەکێشێ): *adj* سەربە دەستەی Dipnoi، lungfish ـەکان دەگرێتەوە *n* ماسی‌یێکی دووهەناسەیی ◌ دیپنوآن
**dipody** *noun, pl.* dipodies
دووپایەیی، کێش یان یەکەیێکی ڕیتھۆنەیی prosodic بە دوو سەروا یان ڕەوتەوە ( dipodic *adj*) ◌ دیپودی
**dipolar** *adjective*
دووجەمسەری، پێوەندی بە dipole ـەوە هەیە ◌ دوقطبی
**dipolar interaction** *noun*
کارلێکی دووجەمسەری ◌ برهم‌کنش دوقطبی
**dipole moment** *noun*
(فیزیک و کیمیا) تەوژمی دووجەمسەری ◌ گشتاور دوقطبی
**dipole** /'dʌɪpəʊl/ *noun*
1 دووجەمسەر 2 ئانتێنێکی (ڕادیۆیی) پێکھاتوو لە دوو میلی (کانزایی) پۆیی horizontal rods کە لە بنەوە بە حاڵ لێک بوونەتەوە ◌ دوقطب
**dipper** /'dɪpə(r)/ *noun*
1 (گیانەوەرناسی) بەرلووزەوە، چۆلەکەچۆمە، سینگ‌سپیلکە 2 کەپچە، ئاوگەردان، چەمچە، ئەسکوێ، کەوچێز، قەلووفە، کشتێل، مێلاک، کەوچک 3 Baptist یان Anabaptist 4 (ئەستێرەوانی، Dipper) ورچی گەورە ◌ 1 زیرآبروک 2 ملاقە 3 تعمیددهندە 4 (با D) دب اکبر
**dippy** /'dɪpɪ/ *adjective* (dippier, dippiest)
(نافەرمی) گەوج، سەرشێت، شێت، foolish (dippiness *n*) ◌ احمق، دیوانە
**diprotic** *adjective*
دووپرۆتۆنی ◌ دوپروتونی
**diprotic acid** *noun*
ترشەڵۆک یا ترشی دووپرۆتۆنی ◌ اسید دوپرتونی
**dipshit** *noun*
خوێڕی، نزم، پەست، کەسێکی stupid یان incompetent ◌ رذل، پست
**dipso** *noun, pl.* dipsos, also alcoholic
(نافەرمی) دووپرۆتۆنی ◌ دوپروتونی
**dipsomania** /ˌdɪpsə(ʊ)'meɪnɪə/ *noun*
دیپسۆمانیا (= ئیشتیای تێرنەبوون لە ئەلکول) ◌ دیپسومانی
**dipsomaniac** /ˌdɪpsə'meɪnɪæk/ *adjective*
شێتی ئەلکول، تووش‌بوو بە دیپسۆمانیا ◌ دیپسومانیک
**dipstick** /'dɪpstɪk/ *noun*
1 شیشی ڕۆن، ڕۆن‌پێو، میلی ڕۆن (بۆ پێوانی) 2 (نافەرمی) مرۆی گەوج ◌ 1 لیترنما 2 آدم احمق
**Diptera** /'dɪpt(ə)rə/ *noun, pl.*
(مێرووناسی) دووباڵان، جووت‌باڵان ◌ دوبالان
**dipteral** /'dɪpt(ə)r(ə)l/ *adjective*
(بیناسازی) دووڕیزستوون، دووڕیزکۆڵەکە ◌ دارای دو ردیف ستون
**dipteran** /'dɪptərən/ *adjective, noun*
*adj* دووباڵ، جووت‌باڵ *n* مێرووی دووباڵ ◌ *adj* دارای دوبال *n* حشرەی دارای دوبال
**dipterocarp** /'dɪpt(ə)rə(ʊ)ˌkɑ:p/ *noun*
میوەدووباڵە یان جووت‌باڵە، بەرەدووباڵە: دارێکی بەرزی دارستانی تیرەیێکی بەربڵاوی (Dipterocarpaceae) زۆرتر باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ◌ نوعی درخت
**dipteron** *noun*
مێرووە دووباڵەکان ◌ حشرات دوبال
**dipterous** /'dɪpt(ə)rəs/ *adjective*
1 دووباڵ، جووت‌باڵ 2 (ڕووەکناسی) دووپەڕە، خاوەن دوو پاشکۆی باڵئاسا ◌ 1 دارای دوبال 2 دوپرە، دیپتروس
**diptych** /'dɪptɪk/ *noun*
وێنەی دووتەختە؛ خودی بەرهەمەم و کارەکە ◌ نقاشی دولتە؛ دیپتیک
**dire** /'daɪə(r)/ *adjective* (direr, direst)
1 ترسێنەر، تۆقێنەر، توند، سەخت، توندوتیژ، قورس، خراپ، ئاستەم، ناخۆش، شیرزە،

نگـەرانکـەر: 2 *dire suffering* (نافـەرمی)
خراپ، ئایەخ ◯ 1 وحشتناک، مخوف، شدید،
وخیم 2 آشفال

**direct** /də'rekt, dɪ-, US daɪ-/ *adjective, adverb*

1 *adj* راست، راستەوخۆ، سەرراست، راستەوانە،
بێنێوان، راستەوراست، بێناوەند: *They are in*
*the ◊ direct contact with the hijackers*
*Protect your ◊ most direct route/course*
*child from direct sunlight by using a*
*2 a direct answer/question ◊ sunscreen*
*That's the -rect opposite of* :دروست، لەروو
3 تەواو، رەبەق *what you told me yesterday*
*adv* راستەوخۆ، بە شێوەیەکی راستەوراست،
*We flew -rect to Hong* :یەکراست، راست
*The 10.40 goes direct to Leeds ◊ Kong*
◯ *adj* 1 مستقیم، مباشر، بی‌واسطه 2 دقیق،
درست، صریح 3 کامل *adv* مستقیماً

**direct access** *noun*

(کامپیوتێر) دەس‌پێ‌ڕاگەیشتنی راستەوخۆ ◯
دستیابی مستقیم

**direct action** *noun*

کردەوەی راستەوخۆ، کرداری راستەوخۆ ◯
اقدام مستقیم

**direct costs** *noun, pl.*

تێچوونە راستەوخۆکان، خەرج‌وباری راستەوخۆ
◯ هزینه‌های مستقیم

**direct current** *noun*

(کارەبا) تەزووی راستەوانە یان راستەوخۆ،
تەوژمی راستەوانە یان راستەوخۆ، تەزووی
نەگۆڕ (کورتەکەی: DC) ◯ جریان مستقیم

**direct debit** *noun*

پێدانی راستەوخۆی قەرز ◯ پرداخت مستقیم بدهی

**direct hit** *noun*

(گوللە، مووشەک و هتد) پێکان، لێکەوتن،
گرتن، ئەنگاوتران ◯ اصابت به آماج

**direct injection** *noun*

تێ‌ڕژاندن یان تێ‌کردنی راستەوخۆ ◯ تزریق
مستقیم

**direction** /də'rekʃn, dɪ-, US daɪ-/ *noun*

1 لا، ئالی، لایەن، دەست، قول، بەر، روو،
*The aircraft was* :حاست، ئاست، ئاراستە
*The road ◊ flying in a northerly direction*
2 *was blocked in both -ns* ریگا، رێ، رێڕەو،
شوێن، ئاقار، ئاست، ئاراستە، سیلە 3 مەیل،
ویست، تێندێتی 4 بەڕێوەبەرایەتی،
*She was entrusted* :هەڵسووڕاندن، چاودێری
6 *with the -n of the project* 5 دەستوور
رێ‌پیشاندان، رێنوێنی 7 (سینەما) دەرهێنان،
*There is some clever -ection* :دەرهێنەری
*8 and the film is very well shot*
(directions) دەستووری کار، دەستوورنامە،
رێنوێنی، دەستوور: *Let's stop and ask for -s*
*Simple directions for assembling the ◊*
9 نێونیشان *model are printed on the box*
◯ 1 سو، جهت، سمت 2 مسیر 3 تمایل 4
مدیریت، اداره 5 امر 6 راهنمایی 7 کارگردانی 8
(در جمع) دستور عمل 9 آدرس

**directional** /də'rekʃənl, dɪ-, US daɪ-/ *adjective*

لە لایەکەوە، لادار (*n* **directionality**؛
**directionally** *adv*) ◯ جهت‌دار

**direction finder** *noun*

لادۆز، لادیاری‌کەر (ی رادیۆیی) ◯ جهت‌یاب

**directionless** /də'rekʃnləs, dɪ-, US daɪ-/ *adjective*

بێ‌مەبەست، بێ‌ئامانج، سەرلێ‌شێواو ◯ بدون
جهت

**directive** /də'rektɪv, dɪ-, US daɪ-/ *noun, adjective*

*n* دەستوور، فەرمان (ی فەرمی) *adj* 1
دەستووردەر(انە) 2 دەستووردەرانە ◯ *n* دستور
*adj* 1 امریه 2 متضمن دستور

**direct labour** *noun*

کاری راستەوخۆ ◯ کار مستقیم

**directly** /də'rektli, dɪ-, US daɪ-/ *adverb, conjunction*

1 *adv* راستەوخۆ، راست، یەکسەرە، خۆجاست:
*The President was not directly involved*
*The two incidents are not directly ◊*
*2 directly opposite/below/ahead ◊ linked*
دروست، بە دروستی، دەسبەجێ، خێرا، زوو:
*3 She left directly after the show*
رێک‌وراست، رەپ‌وراست، بە ئاشکرایی، بێ‌پەردە
*I went home directly I had* :هەرکە *conj*
*finished work* ◯ *adv* 1 مستقیماً 2 دقیقاً، فوراً
3 صریح *conj* به محض این‌که

**direct marketing** *noun*

فرۆشتنی راستەوخۆ (بە رێگای پۆست، تەلەفون و
هتد) ◯ بازاریابی مستقیم

**direct method** *noun*

رێبازی یان شێوازی راستەوخۆ (شێوازێکی
فێرکردنە، کە لەودا زمانی خوێندکار
بەکارناهێنرێ) ◯ روش مستقیم

**directness** /də'rektnəs, dɪ-, US daɪ-/ *noun*

1 راستەوخۆیی، راستبوون، سەرراستی 2
ئاشکرایی، لەڕوویی ◯ 1 مستقیم بودن 2 صراحت

**direct object** *noun*

(رێزمان) بەرکاری راستەوخۆ (یان ئاشکرا)،
تەواوکەری سەربەخۆ ◯ مفعول بی‌واسطه یا مستقیم

**Directoire** /dɪ'rɛktwɑː, French

dirɛktwaʀ/ *adjective*
سەربە شێوازی زاڵی نیوکلاسیکاڵ بەدرێژایی Directory فەرەنسە ◌ دیرکتوار

**director** /də'rektə(r), dɪ-, US daɪ-/ *noun*
1 بەڕێوەبەر، کارگێر، بگێر، سەرپەرشت، چاودێر، بەرپرس: *an -ive/non-executive director* 2 ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی کاری 3 دەرهێنەر ◌ 1 مدیر، مسؤل 2 عضو هیأت مدیرەی شغلی 3 کارگردان

**directorate** /də'rektərət, dɪ-, US daɪ-/ *noun*
1 بەڕێوەبەرایەتی، بگێری: *the environmental directorate* 2 پۆستی بەڕێوەبەرایەتی 3 دەستەی بەڕێوەبەرایەتی، ئەنجومەنی بەڕێوەبەرایەتی یان چاودێری ◌ 1 مدیریت 2 پست مدیریت 3 هیأت مدیره

**director-general** *noun*
بەڕێوەبەری گشتی: *the director general of the BBC* ◌ مدیر کل

**directorial** /ˌdaɪrek'tɔːriəl/ *adjective*
سەربە دەرهێنەری ◌ وابستە بە کارگردانی

**Director of Studies** *noun*
(لە بریتانیا) بەڕێوەبەری بەرنامەی خوێندن یان خوێندنەوە ◌ مدیر برنامەی مطالعاتی

**director's cut** *noun*
بڕشتی دەرهێنەرانە ◌ کات کارگردانی

**directorship** /də'rektəʃɪp, dɪ-, US daɪ-, -tərʃ-/ *noun*
بەڕێوەبەرایەتی، کارگێری ◌ مدیریت

**directory** /də'rektəri, dɪ-, US daɪ-/ *noun, pl.* directories
1 ڕێبەری تەلەفون، کتێبی ڕێنوێنی تەلەفون، کتێبی ڕێ‌پیشاندان، ڕێبەر 2 (کامپیوتێر) شوێنی ڕێکخستنی فایل و بەرنامەکان 3 (the Directory) حکومەتی شۆڕشگێڕانەی فەرەنسە لە 9-1795 ◌ 1 دفتر راهنمای تلفن، دفتر راهنما 2 و 3 دیرکتوری

**directory enquiries** *noun*, also directory assistance
ناوەندی زانیاری تەلەفون (هەڵبەت خەڵک information یشی پێ دەڵێن) ◌ مرکز اطلاعات تلفن

**direct product** *noun*
بەرهەمهێنانی راستەوخۆ ◌ تولید بی‌واسطە

**direct proportion** *noun*, also direct ration
(بیرکاری) هاوڕێژەی راستەوخۆ ◌ تناسب مستقیم

**directress** *noun*
بەڕێوەبەری ژن ◌ مدیرە

**directrix** /dɪ'rɛktrɪks, US dʌɪ-/ *noun, pl.* directrices /-trɪsiːz/
1 بەڕێوەبەری ژن 2 (ئەندازە) هێڵی ڕێنوێنی، هێڵێکی جێگیر بۆ باسکردنی چەماوە یان ناستێ بەکاردێنرێ ◌ 1 مدیرە 2 خط راهنما

**direct speech** *noun*
(ڕێزمان) وەرگرتنی راستەوخۆ، گێرانەوەی راستەوخۆ ◌ نقل‌قول مستقیم

**direct tax** /dɪ'rekt tæx, daɪ-/ *noun*
باجی راستەوخۆ ◌ مالیات مستقیم

**direct taxation** *noun*
باجدانانی راستەوخۆ ◌ مالیات‌بندی مستقیم

**direful** /'daɪəfl/ *adjective*
1 یەکجار خراپ، dreadful 2 ominous ◌ فوق‌العادە بد (direfully *adv*)

**direly** *adverb*
ترسێنەرانە، تۆقێنەرانە، بە توندی، سەخت ◌ بە طور وحشتناک

**direness** /'daɪənəs/ *noun*
ترسێنەربوون، تۆقێنەری، جێی ترس بوون ◌ وحشتناکی

**dirge** /dɜːdʒ, US dɜːrdʒ/ *noun*
1 چەمەری، سەردولکە، شیوەن 2 گۆرانی یان موسیقایەکی وەڕەزکەر یان عاجزکەر ◌ 1 نوحە 2 آواز یا موسیقی ملالت‌آور

**dirham** /'dɪər(h)əm/ *noun*
1 یەکەی بنەڕەتی پارەی مۆرۆکۆ و میرنشینە یەکگرتووەکانی عەرەب، بەرامبەر بە سەد centime لە مۆرۆکۆ و سەد fils لە میرنشینە یەکگرتووەکانی عەرەب 2 یەکەی پارەی لیبیا و قەتەر، بەرامبەر بە هەزاریەکی دینار لە لیبیا و سەدیەکی ریاڵ لە قەتەر ◌ درهم

**dirigible** /'dɪrɪdʒəbl/ = airship

**dirigisme** /'dɪrɪʒɪz(ə)m/ *noun*
کۆنترۆڵی باری بابەتە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان ◌ دیریجیسم

**diriment** /'dɪrɪm(ə)nt/ *noun*
هەڵوەشێنەر، پووچکەرەوە، بەتاڵکەرەوە ◌ باطل‌کنندە

**dirk** /dɜːk, US dɜːrk/ *noun*
خەنجەر، کێرد، تووژگ (جاران لە سکاتلەند) ◌ دشنە، خنجر

**dirndl** /'dɜːndl, US 'dɜːrndl/ *noun*
جۆری بەرگی ژنان ◌ دیرندل

**dirt** /dɜːt, US dɜːrt/ *noun*
1 پیسی، چڵکنی، دزێوی، ناخاوێنی، بۆخڵی، گەماری، گڵاوی 2 خۆڵ، گڵ، قوڕ 3 قسەی ناحەز، قسەی ساردوسووک، ناوێتکە، خراپەوتن، زەمکردن، پاشملە 4 (نافەرمی) گوو، پیسایی، پیسی ◌ 1 کثافت، نجاست 2 خاک، گل 3 حرفهای مستهجن، غیبت 4 (عامیانە) گە

**dirtbag** *noun*
مرۆی هیچ‌وپووچ، توورەکەگوو ◌ آدم پست

**dirt cheap** *adjective, adverb*

(نافەرمی) مفت، یەکجار هەرزان، خۆڕایی ◌ مفت

**dirt farmer** *noun*

جووتیاری کە هەموو کاروبارەکەی بەخۆی دەیکا ◌ درت فارمر

**dirt poor** *noun*

یەکجار هەژار، هیچشکنەبردوو ◌ بسیار فقیر

**dirt road** *noun*

ڕیگای خاکی ◌ جادەی خاکی

**dirt track** *noun*

1 ڕیگای خاکی 2 ڕیگای خاکی بۆ پێشبڕکێی مۆتۆر و هتد ◌ 1 جادەی خاکی 2 پیست خاکی

**dirty** /'dɜ:ti, US 'dɜ:rti/ *adjective* (dirtier, dirtiest), *adverb*

*adj* 1 پیس، چڵکن، دزوێن، چەپەڵ، ناخاوێن، قوڕاوی، پۆخڵ، گەمار، کخە، گلاو،
2 *a -ty mark ،dirty clothes* : پیسکەرەوە:
ناحەز، سووک، هەرزە، ناشیرین، پیس،
شەرماوی، ساردوسووک، شپرزە 3 (هەوا)
ناخۆش، ناساز، باهاتوو، نالۆز، خراپ 4
(ڕەنگ) تەڵخ، لێڵ، مات، مردوو، چڵکن *adv*
یەکجار، گەلێ ( dirtily /'dɜ:tɪli, US
'dɜ:rtɪli/ *adv* ; dirtiness /'dɜ:tinəs, US
'dɜ:rtinəs/ *n* : پیسی، چڵکنی، دزوێنی،
ناخاوێنی، پۆخلی، گەماری، گلاوی) ◌ *adj* 1
چرک، کثیف، کثیف‌کننده 2 زشت، مستهجن 3
(هوا) نامساعد 4 (رنگ) کدر *adv* خیلی

**dirty look** *noun*

(نافەرمی) ڕوانینی پیس ◌ نگاه کثیف

**dirty old man** *noun*

پیرەپیاوی چاوحیز، پیرکوونی، پیرەپیاوی هەرزە، پیرەپیاوی خانمباز ◌ پیرمرد چشم‌چران

**dirty trick** *noun*

1 فێڵ، کەڵەک، تەڵەکە، ناپاکی 2 ( dirties
trick) پیلان ◌ 1 کلک، نارو 2 (در جمع) توطئه

**dirty word** *noun*

جنێو، سخێف، قسەی پیس، قسەی سووک ◌ فحش، حرف مستهجن

**dirty work** *noun*

کاری پیس، گووکاری ◌ کار کثیف‌کننده

**Dis** /dɪs/ *noun*, Latin

دیس: خوای ڕومی جیهانی مردووان یا دوزەخ (بڕوانە Pluto) ◌ دیس

**dis** /dɪs/ *noun*

قسەی نە بەڕێزەوە ◌ صحبت غیرمحترمانه

**dis-** /dɪs/ *prefix*

پێشگر: 1 بێ، بەبێ، دژە، دژ، پەرچە، نا،
پێچەوانە، ئاوەژوو: *disagreeable*،
*disadvantage* ،*disaffection* 2 نەمان،
لەدەسچوون: *disunion* 3 پاک، بە تەواوەتی،
تەواو: *disannul* 4 جیا، دوور: *disperse*،
6 *disbar* 5 *dissociate* دەرکردن، نەهێشتن:
بێبەش‌کردن لە: *disfranchise* (لە لاتینەوە) ◌
پیشوند: 1 بدون، بی، پاد، غیر، وارونه 2 فقدان 3
کاملاً 4 سوا، دور 5 اخراج کردن 6 محروم کردن

**disability** /ˌdɪsə'bɪləti/ *noun*, *pl.* disabilities

1 پەککەوتوویی، لاکەوتەیی، کەمەندامی،
کەمئەندامی، نوقسانی، سەقەتی، کۆچیلی 2
گرفت، عەیب، لەکارکەوتوویی، لەدەسنەهاتن،
پێنەکران، نەتوانین، بێدەسەڵاتی، دەستەوسانی
3 (ماف) لێنەهاتوویی، بەکارنەهاتوویی،
لێنەوەشاوەیی ◌ 1 معلولیت 2 نقص،
ازکارافتادگی، عجز 3 (حقوق) عدم صلاحیت یا اهلیت

**disabled** /dɪs'eɪbld/ *adjective*, *noun*

*adj* پەککەوتە، پەککەوتوو، لاکەوتە،
کەمەندام، کەمئەندام، کۆچیل، نوقسان *n* ( the
disabled) پەککەوتوان، کەمەندامان،
کۆچیلان ◌ *adj* معلول *n* معلولان

**disablement** /dɪs'eɪblmənt/ *noun*

پەککەوتوویی، کەمەندامی، نوقسانی، کۆچیلی ◌ معلولیت

**disabling** *adjective*

پەکخەر، سەقەتێنەر، سەقەتکەر ◌ معلول‌کننده

**disaccharide** /dʌɪ'sakərʌɪd/ *noun*

(کیمیا) دووشەکری، دیساکارید: هەریەک لە دەستە شەکرەکان کە گەردەکانیان دوو پاشەڕۆکی مۆنۆساکاریدیان تیایە ◌ دی‌ساکارید

**disaccord** /ˌdɪsə'kɔ:d/ *noun*, also disagree or disagreement

ناسازی، نەگونجاوی، ڕیکنەکەوتوویی، ناڕێکی، ناتەبایی، ناکۆکی ◌ ناسازگاری، ناهماهنگی

**disadvantage** /ˌdɪsəd'vɑ:ntɪdʒ, US -'væn-/ *noun*

1 لەمپەر، کۆسپ، تەگەرە (بۆ سەرکەوتن) 2
کەموکوڕی، گرفت، کێشە، ئاستەنگ، عەیب،
خاڵی لاوازی 3 بارودۆخی شپرزە یان ناخۆش،
ڕەوشی خراپ، هەلومەرجی نالەبار 4 زیان،
زەرەر، خەسار ◌ 1 مانع 2 عیب، نقص،
نقطه‌ضعف 3 وضعیت نامطلوب 4 آسیب، ضرر

**disadvantaged** /ˌdɪsəd'vɑ:ntɪdʒd, US -'væn-/ *adjective*, *noun*

*adj* هەژار، دەستەنگ، نەدار، بەشبڕاو، بێبەش
*n* (the disadvantaged) هەژاران، دەستەنگان،
نەداران، بەشبڕاوان، بێبەشان ◌ *adj* محروم،
فقیر *n* محرومان

**disadvantageous** /ˌdɪsædvæn'teɪdʒəs/ *adjective*

نالەبار، خراپ، شپرزە، نەگونجاو، ناخۆش، ئاستەنگاوی ◌ نامطلوب

**disadvantageously** /ˌdɪsædvæn'teɪdʒəsli/ *adverb*

نالەبارانە، بە شێوەیەکی شپرزە ◌ به طور نامطلوب

**disaffected** /ˌdɪsəˈfektɪd/ *adjective*
1 ناقایل، نارازی، ناساز 2 دژ، دژبەر، رکەبەر ◌ 1 ناراضی 2 مخالف

**disaffection** /ˌdɪsəˈfekʃn/ *noun*
1 ناقایلی، نارازیبوون، ناسازی، بێزاری 2 دژایەتی، بەرهەڵستی، دژبەری، رکەبەری ◌ 1 نارضایی 2 مخالفت

**disaffilition** /ˌdɪsəfɪliˈeɪʃn/ *noun*
1 بەشداری نەکردن، خۆتەکاندنەوە 2 (پێوە)نەسترانی، ناپێوەستایەتی، پشتپێنەستوویی، ناپێوەبەندایەتی 3 نەبوونی پێوەندی، نەبوونی هاوکاری ◌ 1 عدم مشارکت 2 ناوابستگی 3 عدم ارتباط، عدم همکاری

**disaffirmation** /ˌdɪsæfəˈmeɪʃn/ *noun*
نکوڵی، حاشا، بەپەرچدانەوە، ڕەدکردنەوە، بەدرۆخستنەوە، شکاندن، پێشێل کردن ◌ 1 انکار، رد، تکذیب، نقض

**disafforestation** *noun*
(مێژوویی، ماف) بەخشین لە قانوونی دارستان ◌ معاف از قانون جنگل

**disagreeable** /ˌdɪsəˈgriːəbl/ *adjective*
1 ناخۆش، تاڵ، ناپەسند، نالەبار: *disagreeable odor* 2 (هەوا) ناخۆش، خراپ، ناساز، ناسازگار، نالەبار 3 گرژ، رووتاڵ، مۆن، مرومۆچ، بەدخوو: *a disagreeable person* ◌ 1 نامطلوب 2 (هوا) نامساعد 3 بدعنق، بدخلق

**disagreeableness** *noun*, also disagreeability
1 ناخۆشی، ناپەسندی، نالەباری 2 گرژی، مۆنی، رووتاڵی، مرومۆچی ◌ 1 نامطلوبی 2 بدعنقی

**disagreeably** /-əbli/ *adverb*
بەدخووانە، مرومۆچانە، بە رووتاڵییەوە، بە گرژییەوە ◌ با بدعنقی

**disagreement** /ˌdɪsəˈgriːmənt/ *noun*
کێشە، ناسازی، نەگونجاوی، ڕێک نەکەوتوویی، یەکنەکەوتوویی، ناڕێکی، جیاوازی را و بۆچوون، دژایەتی، ململانێ، ناتەبایی، ناکۆکی، شەڕەقسە، مشتومڕ، شەڕ ◌ اختلاف، ناسازگاری، مخالفت، تضاد، ستیز، مشاجره، دعوا

**disallowance** /ˌdɪsəˈlaʊəns/ *noun*
ڕەتکردنەوە، بەرپەرچدانەوە، نەویستن، نەلێکردن، نکوڵی ◌ رد، انکار

**disappearance** /-ˈpɪərəns, US -ˈpɪr-/ *noun*
1 تیاچوون، لەنێوچوون، نەمان، دوابڕان: *the disappearance of many species of plants and animals from our planet* 2 گومبوون، لاچوون، قومبوون، لەبەرچاولاچوون، بزربوون، وەندابوون، دیارنەبوون، سەرەونگوونبوون ◌ 1 نابودی 2 ناپدیدشدگی

**disappointed** /ˌdɪsəˈpɔɪntɪd/ *adjective*
1 ناهومێد، هیوابڕاو، دڵسارد، ناکام، دڵشکاو، کز، نارەحەت، مات، بەخەم، خەمبار، دڵتەنگ 2 (هیوا) نامراد، دڵشکست، بڕاو، چوو، هیوابڕاو، پووچەوەبوو (*adv* disappointedly: بە ناهومێدی، بە دڵشکستییەوە، دڵساردانە) ◌ 1 ناامید، غمگین، دمغ 2 (امید) بربادرفته

**disappointing** /ˌdɪsəˈpɔɪntɪŋ/ *adjective*
1 هیوابڕ، دڵساردکەرەوە، ناهومێدکەر، دڵناخۆشکەر، مایەی دڵشکستی: *a disappointing result/performance* 2 ناخۆش، شپرزە، نالەبار (*adv* disappointingly: بە داخەوە) ◌ 1 مأیوس‌کننده 2 بد

**disappointment** /ˌdɪsəˈpɔɪntmənt/ *noun*
1 ناهومێدی، دڵساری، دڵشکستی، دڵشکاوی، تێشکاوی، کزی، ماتی، دڵپڕی، دڵتەنگی، خەمباری، نارەحەتی 2 مایەی نارەحەتی یان ناهومێدی ◌ 1 یأس، ناامیدی، سرخوردگی، ناراحتی، تأسف 2 مایەی یأس

**disapproval** /ˌdɪsəˈpruːvl/ *noun*, also disapprobation /ˌdɪsˌæprəˈbeɪʃn/
دژایەتی، پەسندنەکردن، نەهێشتن، نارازیبوون، ناقایلی، بێزاری، نارەزایی، نارەزایەتی ◌ مخالفت، ناخشنودی

**disapproving** /ˌdɪsəˈpruːvɪŋ/ *adjective*
ناقایلانە، دژانە، دژایەتییانە، ناقایل: *She sounded disapproving as we discussed my plans* (*adv* disapprovingly: لە ڕووی دژایەتی یان ناقایلییەوە، لە ڕووی بێزارییەوە یان ناپەسندییەوە، بە نیشانەی ناقایلی یان پەسند نەکردنەوە: *He looked disapprovingly at the row of empty wine bottles*) ◌ مخالفت‌آمیز

**disarmament** /dɪsˈɑːməmənt, US -ˈɑːrm-/ *noun*
چەکداماڵین، چەککردن، چەکدانان، نەهێشتنی چەکوچۆڵ، کەمکردنەوەی هێز و چەکوچۆڵی سەربازی ◌ خلع سلاح

**disarmament conference** *noun*
کۆبوونەوە یان کۆنفرانسی چەکداماڵین ◌ کنفرانس خلع سلاح

**disarmer** *noun*
لایەنگری نەهێشتنی چەکوچۆڵی ناوکی ◌ دیس‌آرمر

**disarming** /dɪsˈɑːmɪŋ, US -ˈɑːrm-/ *adjective*
هێدیکەرەوە، ئارامکەرەوە، ئاشتکەرەوە، ناخۆشیڕەوێن، خەمڕەوێن، خەفەتبەر، ingratiating: *a disarming smile*: *Her disarming honesty immediately created a much less hostile atmosphere in the room*

**disarmingly** /dɪsˈɑːmɪŋli, US -ˈɑːrm-/ (*adv*: به شێوەیەکی هێدی کەرەوە، دامرکێنەرانە، خەمڕەوێنانە) ◌ آرام‌بخش

**disarrangement** /ˌdɪsəˈreɪndʒ, US ənt/ *noun*
شێواوی، ئاڵۆزی، تێکچوویی، تێکەوڵێکەیی، نارێکی، شپرزەیی ◌ آشفتگی، بی‌ترتیبی

**disarray** /ˌdɪsəˈreɪ/ *noun*
شێواوی، ئاڵۆزی، تێکچوویی، تێکەوڵێکەیی، نارێکی، شپرزەیی، دۆخی شێواوی یان نارێکی: *the room was in -rray* ◌ آشفتگی، بی‌ترتیبی

**disarticulation** *noun*
جیاکردنەوە یان لێک‌کردنەوە (ئێسک لە جومگە) ◌ دیس‌آرتیکولاسیون

**disassembler** /ˌdɪsəˈsembl(ə)r/ *noun*
جیاکەرەوە، هەڵوەشێنەر، لێک‌کەرەوە ◌ سواساز

**disassembly** /ˌdɪsəˈsembli/ *noun*
جیاکردنەوە، هەڵوەشاندن، لێک‌کردنەوە ◌ سواسازی

**disassociation** /dɪsəˈsəʊʃieɪʃn, -ˈsəʊs-, US -ˈsoʊ-/ *noun*
جیاکردنەوە، لێک‌داپڕاندن، لێک‌هەڵبڕاندن، لێک‌کشاندنەوە، لێک‌کردنەوە، لێک‌ترازان، لێک‌هەڵوەشاندن ◌ تفکیک، تلاشی

**disaster** /dɪˈzɑːstə(r), US -ˈzæs-/ *noun*
1 بەڵا، تەڵەزگە، ڕووداوی ناخۆش، کۆست، مەینەتی، نەهامەتی، کارەسات، بێ‌بەختی، بەدبەختی، لێ‌قەوماوی، ڕۆژەڕەشی، کڵۆڵی، قوڕبەسەری، catastrophe: *environmental disaster* ◊ *financial disasters* 2 تێ‌شکان، شکست: *The play's first night was a total disaster* 3 (نافەرمی) مایەی ئابڕووچوون یان تێ‌شکان ◌ 1 مصیبت، فاجعه، بدبختی 2 شکست 3 (عامیانه) موجب شکست

**disaster area** *noun*
1 ناوچەی کارەساتاوی یان بەڵاتووش‌بوو، ناوچەی زیان‌لێ‌کەوتوو (بوومەلەرە، سێلاو و هتد) 2 (نافەرمی) شوێنی پیس ◌ 1 ناحیه‌ی مصیبت‌زده 2 (عامیانه) مکان کثیف

**disastrous** /dɪˈzɑːstrəs, US -ˈzæs-/ *adjective*
کارەساتاوی، خراپ، ماڵوێرانکەر، بەقوڕگر، ناخۆش، ڕەش، شپرزە، calamitous: *a disastrous flood* ◊ *a disastrous score* (disastrously *adv*: بە شێوەیەکی شپرزە، زۆر خراپ) ◌ فاجعه‌آمیز، فجیع

**disavowal** /ˌdɪsəˈvaʊəl/ *noun*
بەدرۆخستنەوە، نکوڵی، حاشا (لێ‌کردن)، نەچوونەژێر، بێ‌لێ‌نەنان، مل‌پیانەکردن ◌ تکذیب، انکار

**disbanded** *adjective*
لێک‌هەڵوەشاو، لێ‌کەوەبوو، لێک‌ترازاو ◌ منحل‌شده

**disbandment** /dɪsˈbændmənt/ *noun*
لێک‌هەڵوەشاندن، لێک‌ترازاندن، شێواندن، تێکدان ◌ اخلال، برهم‌زنی

**disbarment** /dɪsˈbɑː(r)ment/ *noun*
دەرکران لە کاری پارێزەری ◌ محرومیت از شغل وکالت

**disbelief** /ˌdɪsbɪˈliːf/ *noun*
بێ‌باوەڕی، بێ‌بڕوایی: *He stared at me in disbelief* ◌ بی‌اعتقادی

**disbeliever** *noun*

**disbelieving** *adj* (بێ‌باوەڕ، بێ‌بڕوا؛ disbelievingly *adv*) ◌ بی‌اعتقاد

**disbenefit** = disadvantage

**disburdenment** /dɪsˈbɜːdnmənt/ *noun*
لابردن یان هەڵگرتنی ئەرک یان زەحمەت، لەکۆڵ‌کردنەوە، ڕزگارکردن، سووک‌کردن، داگرتن ◌ رفع زحمت، دیس‌بوردنمنت

**disbursement** /dɪsˈbɜːsmənt, US -ˈbɜːrsmənt/ *noun*
1 خەرج، مەزاخ، بەخت‌کردن: *the disbursement of funds* 2 پێدان، دان 3 بڕەپارە ◌ 1 خرج 2 پرداخت 3 مبلغ

**disc** /dɪsk/ *noun*, US also disk
1 دیسک، سێلک، پەپکە، خەپلە، شتێکی خڕ، ناسک و تەخت، خڕۆچکە: *the disk of the sun* 2 دیسکی کۆمپاکت، سێلکی پەستێنراو یان پەستوراو 3 سێلک یا دیسکی قەوان 4 (پزشکی، هەروەها intervertebral disc) دیسک، بڕبڕەبەند، پەپکە(لە): تویێکی کرۆژەیی کە بڕبڕە (لە)پاڵ‌یەکەکان لە تیرەگەی پشت لێک جیادەکاتەوە، پێکهاتە یان بەشێکی تەخت، خڕی گیانەوەری یان ڕووەکی 5 (ڕووەک‌ناسی) بەشی ناوەندی گوڵ (لە ڕووەکە composite ـەکاندا)، قەڵغان(ـە)، تۆپ (وەک گوڵەبەڕۆژە) 6 سێل، دیسک: هەریەک لەو تیغە خڕ و پۆڵاییانەی disc harrow 7 (کۆن) = discus ◌ 1 دیسک، قرص 2 دیسک فشرده 3 صفحه‌ی گرامافون 4 (پزشکی) دیسک 5 (گیاه‌شناسی) طبق 6 دیسک

**discalced** /dɪsˈkalst/ *adjective*
پێ‌پەتی، پێ‌خاوس (ئاماژە بە چەندین تیرەی تونرەوی ڕەبەنە کاتۆلیکییەکان، لە لاتین *discalceatus* "unshod") ◌ پابرهنه

**discardable** /dɪsˈkɑːdəb(ə)l/ *adjective*
فڕێدەنی، بۆ فڕێدان دەبێ، فڕێدەدری، بەکارنایە ◌ دورریختنی

**discard** /ˈdɪskɑːd, US -kɑːrd/ *noun*
شتێ فڕێدەنی یان فڕێدراو، شتی بێکارە (discarded *adj*: بێکارە، فڕێدراو، حەوادراو،

تووڕدراو) ۞ چیز دورریخته

**disc brake** *noun*

وەستێنەی پەپکەیی یان دیسکی ۞ ترمز دیسکی

**disc camera** *noun*

دووربینی پەپکەیی، کامێرای دیسکی یان پەپکەیی ۞ دوربین دیسکی

**discernible** /dɪˈsɜːnəbl/ *adjective,* also discernable

1 شیاوی لێک کردنەوە، دیار، لەتێگەیشتن‌هاتوو، پێی‌دەزانرێ 2 دیار، ئاشکرا (discernibly /dɪˈsɜːnəbli/ *adv*: بە ئاشکرایی، بە روونی، بە شێوەیەکی بەرچاو) ۞ 1 قابل تشخیص 2 واضح

**discerning** /dɪˈsɜːnɪŋ, US -ˈsɜːrn-/ *adjective*

1 ورد، وردبین، باریک‌بین، تێگەیشتوو، موودەرکێش، بەسەرنج، تێبین، بەسەلیقە: *The discerning customer will recognize this as a high quality product* 2 شارەزا، خاراو، پڕئەزموون (discerningly *adv*) ۞ 1 بصیر، ظریف 2 خبره

**discernment** /dɪˈsɜːnmənt, US -ˈsɜːrn-/ *noun*

بینین، وردبینی، وردی، تێبینی، تێگەیشتوویی، بەسەرنجی، توانایی لێک کردنەوە، موودەرکێشی، تێگەیشتن، پێزانین: *He shows great* -*ernment in his choice of friends* ۞ بصیرت، مشاهده، تشخیص، درک

**disc flower** *noun,* also disk floret

ئەو رووەکانەی کە گوڵەکانیان لەسەر قەڵغانەیە؛ گوڵێکی tubular لە نێو توێی رووەکێکی composite (پڕوانە ray flower) ۞ گل صفحه‌ای یا کپه‌ای

**discharge** /ˈdɪstʃɑːdʒ, US tʃɑːrdʒ/ *noun*

1 بەتاڵ‌کردن، داگرتن، خاڵی کردن، دابەزاندن، والاکردن 2 جێبەجێ‌کردن، راپەڕاندن، کردن (ی ئەرک) 3 دانەوە، پێدانەوە 4 خستن، تێگرتن، تەقاندن، هاویشتن 5 مۆڵەت‌پێدان، ناردنەوە 6 چوونەدەرەوە 7 دەرکردن، هاویشتنە دەرەوە، خستنەدەرەوە، شتی دەردراو، مەتریالی دەرهاویژراو، دەرهاویشتە 8 بەتاڵ‌کردنی بارگەی ئێلیکتریکی 9 (برین) چڵک، زووخاو، زووخ، کێم، هەو، زنجک، زلزلە، گفرت، شێ 10 (زیندانی) ئازادی، بەربوون، بەردان، بەرەڵاکردن ۞ 1 تخلیه 2 انجام، ایفا 3 بازپرداخت 4 شلیک 5 مرخصی 6 خروج 7 اخراج، مادەی خروجی 8 تخلیەی الکتریکی 9 (زخم) چرک 10 آزادی

**discharger** *noun*

بەتاڵ‌کەر، داگر، دەزگای بەتاڵ‌کردن ۞ تخلیه‌کننده

**disc harrow** *noun*

خێشکی سێڵ‌دار یان پەڕپەڕ، زەویڕنی پەڕەدار (بۆ هەڵگێڕانەوە و وردکردنی خاک و فەوتاندنی بژار) ۞ دیسک هارو

**disciform** *adjective*

پەپکەئاسا، سێڵک‌ئاسا، پەپکەیی، شێوەخەپلە ۞ قرص‌مانند

**disciple** /dɪˈsaɪpl/ *noun*

1 مرید، شاگرد، لایەنگر، چراغ، پەیڕەو، شوێن‌کەوتوو: *a disciple of Freud* 2 حەواری ۞ 1 مرید، پیرو 2 حواری

**discipleship** *noun*

شاگردی، مریدی، پەیڕەوی، چراغی ۞ پیروی

**disciplinarian** /ˌdɪsəplɪˈneəriən, US -ˈner-/ *noun*

کەسێکی سەختگر، مرۆی توند، بنیادەمی بەبەندوبەست ۞ آدم منضبط

**disciplinary** /ˈdɪsəplɪnəri, ˌdɪsəˈplɪnəri, US ˈdɪsəpləneri/ *adjective*

دیسیپلیناری، ئینزباتی، بەندوبەستی‌یانە، بەندوبەستانە، توندانە، سزایی، سزادەرانە: *The company will be taking disciplinary action against him* ◊ *disciplinary problems* ۞ انضباطی، تنبیهی

**discipline** /ˈdɪsəplɪn/ *noun*

1 بەندوبەست، توندایەتی، رێکی، رێک‌وپێکی، توندوتۆڵی 2 شێوە، رێگا، شێواز، رێچکە 3 سزا، تەمێ، punishment 4 بواری خوێندن، لقی خوێندن 5 کۆمەڵە دەستوور، instruction (disciplinal *adj*) ۞ 1 انضباط، انتظام، نظم 2 روش 3 مجازات 4 رشتەی تحصیلی 5 مقررات

**disciplined** *adjective*

بەدیسیپلین، بەبەندوبەست، رێک‌وپێک، توندوتۆڵ: *a disciplined mind* ◊ *a disciplined approach to work* ۞ منضبط

**disc jockey** *noun,* also disk jockey

پێشکەش‌کار یان بەڕێوەبەری بەرنامەی موسیقای پاپ (ب.ت. لەسەر تەلەفزیۆن و رادیۆ) ۞ مجری برنامەی موسیقی

**disclamation** /ˌdɪskləˈmeɪʃən/ *noun*

رەت‌کردنەوە، بەرپەرچ‌دانەوە، نەویستن، نەلێ‌کردن، بەدرۆخستنەوە، نەچوونەژێر، مل‌پیانەکردن، حاشا، نکۆڵی ۞ رد، تکذیب، انکار

**disclaimer** /dɪsˈkleɪmə(r)/ *noun*

1 رەت‌کردنەوە، بەرپەرچ‌دانەوە، نەویستن، نەلێ‌کردن، بەدرۆخستنەوە، نەچوونەژێر، مل‌پیانەکردن، حاشا، نکۆڵی 2 نامەی بەدرۆخستنەوە یان بەرپەرچ‌دانەوە ۞ 1 تکذیب، انکار 2 تکذیب‌نامه

**disclosure** /dɪsˈkləʊʒə(r), US -ˈkloʊ-/ *noun*

1 بلاوکردنەوە، راستی‌لێ‌وتن، لەقاودان، گێڕانەوە، ئاشکراکردن، خستنەوەڕوو، دەرخستن

1 قاو ۞ 2 بابەتی بلاوەبوو یان ئاشکراکراو، 1 افشا، بازنمود 2 مطلب افشاشده

**disco** /'dɪskəʊ, US 'dɪskoʊ/ *noun, pl.* discos
دیسکۆ، دیسکۆتێک، جۆرێ موسیقای هەڵپەڕکێی باوی ساڵانی 1970 ۞ دیسکو، دیسکوتک

**discobolus** /dɪ'skɒbələs/ *noun, pl.* discoboli /-laɪ/
سێلکاوێژ، سێلکخەر، پەپکەهاوێژ، دیسکهاوێژ ۞ دیسک‌انداز

**discoid** /'dɪskɔɪd/ *adjective*
پەپکەئاسا، پەپکەیی، سێلکی، شێوەپەپکە، پان و خڕ ۞ دیسک‌مانند

**discoidal** /'dɪskɔɪdl/ *adjective*
سێلکئاسا، پەپکەئاسا، شێوەپەپکە، پان و خڕ ۞ دیسک‌مانند

**discoloration** /ˌdɪsˌkʌlə'reɪʃn/ *noun,* BrE also discolouration
ڕەنگگۆڕان، ڕەشداگەڕان، تێکچوونی ڕەنگ ۞ تغییر رنگ

**discoloured** *adjective*
ڕەنگگۆڕاو، ڕەشداگەڕاو، ڕەنگتێکچوو ۞ تغییر رنگ‌یافته

**discombobulated** *adjective*
تەواوپەشۆکاو، پاکتاساو، لاپتاساو ۞ کاملاً سراسیمه

**discomfited** *adjective*
نارەحەت، شلەژاو، تاساو، واقوڕماو ۞ معذب، سراسیمه

**discomfiture** /dɪs'kʌmfɪtʃə(r)/ *noun*
1 نارەحەتی، بزۆر، شڵەژاوی، تاساوی، سەرسامی، واقوڕماوی 2 تێشکان، شکان، بەزین 3 هەڵوەشاندن، بەتاڵکردنەوە، پووچکردنەوە ۞ 1 ناراحتی، سراسیمگی 2 شکست 3 باطل‌سازی

**discomfort** /dɪs'kʌmfət, US -fərt/ *noun*
1 ئێش، ژانی کەم 2 هەست بە نارەحەتی کردن، نارەحەتی (دەروونی)، نیگەرانی، دڵەڕاوکێ 3 زەحمەت، دەرد، سەختی، ڕەنج ۞ 1 درد 2 ناراحتی 3 زحمت، مشقت

**discommodity** /'dɪskə'mɒdɪti/ *noun*
نارەحەتی، هەراسانکردن، تەنگپێهەڵچنین، تەنگەتاوکردن، وەڕەزکردن، هەڵپێچان ۞ ناراحتی، مزاحمت

**discomposure** /dɪskəm'pəʊʒə(r), US -'poʊ-/ *noun*
شێواوی، ئاڵۆزی، ناثارامی، شلەژاوی، نیگەرانی، نارەحەتی، پەرێشانی ۞ آشفتگی، اضطراب

**disconcerted** *adjective*
نیگەران، دڵەدوا، پەرێشان، تێکچوو، نارەحەت، سەرلێشێوێنراو: *I was disconerted to find that everyone else already knew it* ۞ نگران، معذب

**disconcerting** *adjective*
نیگەرانکەر، نارەحەتکەر، حەجمانلێبڕ، ئاسایشلێهەڵگر، سەرلێتێکدەر، تاسێنەر، پەشۆکێنەر (*adv* disconcertingly: بە شێوەیەکی نیگەرانکەر یان نارەحەتکەر) ۞ نگران‌کننده، دستپاچه‌کننده

**disconcertion** *noun,* also disconcertment
سەرسامی، نارەحەتی، پەشۆکاوی، تاساوی، شلەژاوی ۞ سراسیمگی، دستپاچگی

**disconformity** *noun, pl.* disconformities
ڕێکنەکەوتوویی، یەکنەکەوتوویی، نەسازاوی ۞ عدم توافق

**disconnected** /ˌdɪskə'nektɪd/ *adjective*
1 جیا، لێکجیا، لێکدابڕاو، دابڕاو، هەڵبڕاو 2 پچڕپچڕ، نەچووەسەریەک، ناپێوەندیدار، بێسەروبەرە، بێسەروبن: *a -nnected narrative* 3 شێواو، ناڕێکوپێک ۞ 1 منفصل 2 بی‌ارتباط 3 آشفته

**disconnectedly** *adverb*
بە شێوەیەکی لێکجیا ۞ بە طور منفصل

**disconnection** /ˌdɪskə'nekʃn/ *noun,* also disconnexion
1 دابڕان، پچڕان، ڕۆیشتن، هەڵبڕان 2 دابڕین، هەڵبڕین، لێککردنەوە، جیاکردنەوە ۞ 1 قطع 2 جداسازی

**disconsolate** /dɪs'kɒnsələt, US -'kɑːn-/ *adjective*
خەمبار، بەخەم، کز، مات، پەرێشان، دڵبڕ، دڵشکاو، دڵتەنگ: *The disconsolate players* ◊ *the team* ◊ *left for home without a trophy* ۞ *returned disconsolate from three losses* اندوهگین، افسرده

**disconsolately** /dɪs'kɒnsələtli, US -'kɑːn-/ *adverb*
خەمبارانە ۞ بە طور اندوهگین

**disconsolateness** *noun,* also disconsolation
خەمباری، پەژارەباری، دڵشکاوی، ماتی، کزی، پەرێشانی، دڵبڕی، ماتی، دڵتەنگی ۞ اندوهگینی، افسردگی

**discontent** /ˌdɪskən'tent/ *noun, adjective,* also discontentment /ˌdɪskən'tentmənt/
*n* ناقایلی، نارەزایەتی، بێزاری، نارازیتی *adj* ناقایل، نارەزامەند، بێزار، نارازی ۞ *n* نارضایی، عدم رضایت، ناخشنودی *adj* ناراضی، ناخشنود

**discontented** /ˌdɪskən'tentɪd/ *adjective*
ناقایل، نارەزامەند، بێزار، نارازی، ناخۆشحاڵ ۞ ناراضی، ناخشنود

**discontentedly** /ˌdɪskən'tentɪdli/ *adverb*
ناقایلانە، بە نارەزایەتی ۞ بە طور ناراضی

**discontinuation** /ˌdɪskentɪnjʊːˈeɪʃn/ *noun*, also discontinuance /ˌdɪskənˈtɪnjʊəns/
1 راویـــستان، داخـــران، بـــەجیٚهیٚـــشتن، دەس‌کیٚـشانەوە، کارنـەکردن، راگـیران، پـسان، پچـڕان، دابـڕان، نابـەردەوامی، لەسـەرنەمانەوە، درێژەنـەدان 2 هەڵوەسـتە، پـشوو ۞ 1 توقـف، ترک، قطع 2 وقفه

**discontinuity** /ˌdɪsˌkɒntɪˈnjuːəti, US -ˌkɑːntəˈnuː-/ *noun*, *pl*. -ies
1 جیـــایی، جـــودایی، پێکەوەنەبەســـتراوی، نابـەردەوامی، لێـک‌کـراوی، دابـڕاوی، پـساوی، پچـڕاوی، هەڵـبڕاوی، جیابوونـەوە، دابـڕان 2 کەلێن، هەڵوێـستە، مەودا ۞ 1 عـدم پیوسـتگی، انفصال، انقطاع 2 شکاف، فاصله

**discontinuous** /ˌdɪskənˈtɪnjuəs/ *adjective*
لێـک‌جیـا، لێـک‌کـراو، نابـەردەوام، ناپەیوەسـت، پێکەوەنەبەستراو، دابڕاو، پساو، پچڕاو، هەڵبڕاو (discontinuously *adv*: لێـک‌دابڕاوانـە، بـە شێوەیەکی لێک‌جیا) ۞ ناپیوسته، منقطع، گسسته

**discord** /ˈdɪskɔːd, US -kɔːrd/ *noun*
1 کێشە، ناسازی، نەگونجاوی، رێک‌نەکەوتوویی، جیـاوازی راوبۆچـوون، دژایـەتی، نـاکۆکی 2 ململانێ، شـەڕ 3 دەنگی نـاخۆش یـان نـاجۆر 4 (موسـیقا) یـەک‌نەگرتنـەوە، ناهـاودەنگی ۞ 1 ناسازگاری، اختلاف، عدم توافق 2 دعـوا 3 صـدای ناهنجار 4 (موسیقی) ناهم‌خوانی، تنافر

**discordance** /dɪsˈkɔːdəns, US -ˈkɔːrd/ *noun*
1 کێشە، ناسازی، نەگونجاوی، رێک‌نەکەوتوویی، جیـاوازی راوبۆچـوون، دژایـەتی، نـاکۆکی 2 ململانـێ، شـەڕ 3 (موسـیقا) یـەک‌نەگرتنـەوە، ناهاودەنگی ۞ 1 ناسازگاری، اختلاف، عدم توافق 2 دعوا 3 (موسیقی) تنافر، ناهم‌خوانی

**discordant** /dɪsˈkɔːdənt, US -ˈkɔːrd-/ *adjective*
1 ناسـاز، یەک‌نەکەوتوو، دژ، ناتەبا، ناکۆک: *a discordant family* 2 نـــاخۆش، نـــاجۆر، بێ‌ئاهەنگ ۞ 1 مخالف، متضاد 2 ناهنجار

**discotheque** /ˈdɪskətek/ *noun*
دیـسکۆتێک ۞ دیـسکوتک

**discount** /ˈdɪskaʊnt/ *noun*
لـێ‌دەرکـردن، لـێ‌داشـکاندن، لـێ‌فرێـدان، کەم‌بوونەوە، داشکان: *discount rates/prices* ◊ *to get/give/offer a -scount* ۞ تخفیف، کاهش

**discounter** /ˈdɪskaʊntə(r)/ *noun*
هەرزان‌فرۆش، هەرزان‌جان (دووکان یان کەسێ) ۞ ارزان‌فروش

**discount rate** *noun*
رادەی لێ‌دەرکردن، رێژەی لێ‌داشکاندن (بانکی ناوەندی بۆ بانکەکانی‌تر) ۞ نرخ تخفیف

**discount shop** *noun*, also discount house or discount store
دووکـان یـان فرۆشـگەی هـەرزان‌فرۆشـی ۞ فروشگاه ارزان‌فروشی

**discouraged** *adjective*
دڵسارد، هیوابڕاو، ناهومێد، دڵ‌بەرداو ۞ مأیوس، ناامید

**discouragement** /dɪsˈkʌrɪdʒmənt, US -ˈkɜːr-/ *noun*
1 ناهومێـدی، بـێ‌هیـوایی، هیوابـڕاوی، دڵـساری، دڵـساردکردنەوە، چاوترسێن‌کـردن، ورەدابەزانـدن 2 شـتی دڵـــساردکەرەوە 3 نەهێـشتن، بـەرگرتن، رێ‌گـرتن، پێش‌گـرتن، پێـشگیری 4 تـێ‌شـکان، سەرنەکەوتن ۞ 1 یأس، ناامیدی، مأیوس‌سازی 2 عامل ناامیدکننده 3 منع 4 شکـست

**discouraging** /dɪsˈkʌrɪdʒɪŋ, US -ˈkɜːr-/ *adjective*
هیوابـــڕ، دڵـــساردکەرەوە، ناهومێدکـــەر: *a discouraging result* ۞ یأس‌آور

**discouragingly** /dɪsˈkʌrɪdʒɪŋli, US -ˈkɜːr-/ *adverb*
هیوابڕانە، بـە شـێوەیەکی دڵـساردکەرەوە ۞ بـە طور یأس‌آور

**discourse** /ˈdɪskɔːs, US -kɔːrs/ *noun*
1 وتاردان، قـسەکردن، دوان، ئاخافتن، لێدوان: *a discourse on issues of gender and sexuality* 2 گفـتوگـۆ، وت‌ووێـژ 3 راوێـژ، بابـەت، مژار، گوتـار، وتـار 4 (زمانـەوانی) وتـار، گوتار، وتە ۞ 1 سخن‌رانی، نطق 2 گفـت‌وگـو 3 مقاله، گفتار، رساله 4 (زبان‌شناسی) گفتمان

**discourse analysis** *noun*
(زمانەوانی) وتەشیکاری ۞ سخن‌کاوی

**discourteous** /dɪsˈkɜːtiəs, US -ˈkɜːrt-/ *adjective*
بێ‌ڕەوشـت، بـێ‌ئـەدەب، بـێ‌ڕەوشـتانە، توندانـە، رووشە، توند، rude (discourteousness *n*) ۞ بی‌تربیت، بی‌ادب، بی‌ادبانه، تند

**discourteously** /dɪsˈkɜːtiəsli, US -ˈkɜːrt-/ *adverb*
بێ‌ڕەوشتانە، بێ‌ئەدەبانە ۞ بی‌ادبانه

**discourtesy** /dɪsˈkɜːtəsi, US -ˈkɜːrt-/ *noun*, *pl*. discourtesies
بـێ‌ڕەوشـتی، بـێ‌ئـەدەبی، تونـدی، بـێ‌ڕێـزی، بێ‌حورمـەتی، بێ‌قـەیی، rudeness ۞ بـی‌ادبـی، بی‌احترامی

**discoverable** /dɪsˈkʌvərəbl/ *adjective*
لەدۆزینـەوەهاتوو، دەدۆزرێتـەوە، پەیـدا دەبـێ، دەبینرێتەوە ۞ کشف‌شدنی

**discoverer** *noun*
دۆزەر، دۆزەرەوە: *the discoverer of penicillin* ۞ کاشف

**discovert** /dɪsˈkʌvət/ *noun*

بێ‌مێرد، بێ‌شوو، بێوەژن ۞ غیرمُحصنه

**discovery** /dɪˈskʌvəri/ *noun, pl.* discoveries
1 دۆزینەوە، دیتنەوە، پەیداکردن: *the -scovery of new talent in the art world* 2 شتی دۆزراوە ۞ 1 اکتشاف، کشف 2 چیز کشف‌شده

**Discovery Day** = columbus day

**discredit** /dɪsˈkredɪt/ *noun*
1 بێ‌ئابڕوویی، ئابڕووچوویی، ترۆیی، شوورەیی، ناوزڕاوی، زڕاوی، سووکی، ڕووڕەشی 2 بێ‌باوەڕی، بێ‌بڕەوی 3 بێ‌باوەڕی، شک، گومان، دوودڵی، doubt 4 مایەی ئابڕووچوون یان بێ‌باوەڕیێ ۞ 1 بدنامی 2 بی‌اعتباری 3 تردید 4 مایەی بدنامی

**discreditable** /dɪsˈkredɪtəbl/ *adjective*
ناحەز، ئابڕووبەرە، قەبە، عەیب، ناشیرین، شەرماوی، ناوزڕێن (*adv* :discreditably ناحەزانە، ئابڕووبەرانە) ۞ قبیح، بدنام‌کننده

**discredited** *adjective*
1 بێ‌ئابڕوو، حەیاپێونەماو، سووک‌وترۆ، ناوزڕاو، نێوداکەوتوو، چاوبەرەوژێر، ڕووڕەش 2 بێ‌بڕەو، پووچەوەکراو، پووچەڵ‌کراو، بێ‌باوەڕکراو ۞ 1 بدنام 2 ازاعتبارافتاده

**discreet** /dɪˈskriːt/ *adjective*
1 هۆشیار، قایم‌کار، ئاگادار، ژیر، دووربین، تێگەیشتوو، بەفکر، بەبیر، ئاگادارانە، ژیرانە 2 کەم‌قسە، دەم‌قورس، سرپۆش 3 نهێنی، پەنامەکی ۞ 1 محتاط، باملاحظه، بصیرانه، محتاطانه 2 تودار 3 مخفیانه

**discreetly** /dɪˈskriːtli/ *adverb*
هۆشیارانە، ئاگادارانە، بە پارێزەوە، بە وریایی‌یەوە، ژیرانە: *She coughed discreetly to announce her presence* ۞ با احتیاط

**discreetness** *noun*
هۆشیاری، قایم‌کاری، ئاگاداری، ژیری، دووربینی ۞ احتیاط، بصیرت

**discrepancy** /dɪsˈkrepənsi/ *noun,* also discrepance, *pl.* discrepancies
جیاوازی، ناسازی، ناکۆکی، دژایەتی، ناتەبایی، یەک‌نەگرتنەوە، فەرق: *wide -repancies in prices quoted for the work* ۞ اختلاف، مغایرت

**discrepant** /dɪsˈkrepənt/ *adjective*
جیاواز، ناساز، ناکۆک، ناتەبا، دژ، یەک‌نەگرەوە ۞ مغایر، متضاد

**discrete** /dɪˈskriːt/ *adjective*
جیا، دابڕاو، ناپێوەست، ناپەیوەست، نابەردەوام، لێک‌جیا، پێکەوەنەبەستراو، نەلکاو، *several discrete sections* :noncontinuous ۞ مجزا، گسسته، منفصل

**discretely** /dɪˈskriːtli/ *adverb*
بە شێوەیەکی جیا، دابڕاوانە، ناپێوەستانە ۞ بە طور مجزا

**discreteness** /dɪˈskriːtnəs/ *noun*
جیایی، جیابوونەوە، لێک‌جیایی، دابڕاوی، ناپێوەستی، پێکەوەنەبەستراوی ۞ انفصال، جدایی، گسستگی

**discretion** /dɪˈskreʃn/ *noun*
1 هۆشیاری، ئاگاداری، وردبوونەوە، سەرنج‌پێدان، دووربینی، ژیری، ئاقڵی، تێگەیشتوویی 2 بۆچوون، ڕا، پێ‌باش‌بوون، بە چاک‌زانین 3 ئازادی بڕیاردان، سەرپشکی، دەسەڵات، توانایی بڕیاردان: *I'll leave it up to you to use your discretion* 4 سرپۆشی، ڕازپۆشی ۞ 1 احتیاط، دقت، بصیرت 2 نظر، صواب‌دید 3 اختیار، قدرت تصمیم‌گیری 4 رازداری

**discretionary** /dɪˈskreʃənəri, US -neri/ *adjective,* also discretional /dɪˈskreʃənəl/
1 چۆنیەتی پێ‌باش‌بوون، بەندە بە پێ‌باش‌بوون 2 لەژێر دەسەڵات ۞ 1 بسته به صلاح‌دید 2 تحت اختیار

**discretionary powers** *noun*
ئازادی یا توانایی بڕیاردان، سەرپشکی، دەسەڵات ۞ قدرت تصمیم‌گیری

**discriminable** /dɪˈskrɪmɪnəb(ə)l/ *adjective*
1 شیاوی لێک‌کردنەوە، شیاوی ناسینەوە، دیاری دەکرێ، دەناسرێتەوە 2 جیاواز، جیا ۞ 1 قابل تمیز 2 متفاوت

**discriminably** /dɪˈskrɪmɪnəb(ə)li/ *adverb*
بە شێوەیێ کە لێک کرێتەوە یان بناسرێتەوە ۞ به طور قابل تمیز

**discriminant** /dɪˈskrɪmɪnənt/ *noun*
تایبەتمەندی جیاکەرەوە ۞ ویژگی متمایزکننده

**discriminating** /dɪˈskrɪmɪneɪtɪŋ/ *adjective*
1 ورد، بەسەرنج، وردبین، موودەرکێش، تیژ 2 = discriminatory (discriminatingly /dɪˈskrɪmɪneɪtɪŋli/ *adv*) ۞ ظریف، دقیق

**discrimination** /dɪˌskrɪmɪˈneɪʃn/ *noun*
1 تێگەیشتن، لێک‌کردنەوە، جیاکردنەوە، ناسینەوە، زانین، ناسین 2 جیاوازی‌دانان، هەڵاواردن، فەرق‌خستن ۞ 1 تشخیص، فهم 2 تبعیض

**discriminative** /dɪˈskrɪmənetɪv/ *adjective*
جیاوازی‌دانەرانە، جیاکردنەوەیی، فەرق‌خەرانە ۞ تبعیضی

**discriminator** *noun*
تایبەتمەندی جیاکەرەوە ۞ ویژگی متمایزکننده

**discriminatory** /dɪˈskrɪmɪnətəri, US dɪˈskrɪmɪnətɔːri/ *adjective*
جیاوازی‌دانەرانە، جیاکردنەوەیی، فەرق‌خەرانە:

◊ *discriminatory practices/rules/measures sexually/racially discriminatory laws* (discriminatorily *adv*) ۞ تبعیض‌آمیز

**discursive** /dɪsˈkɜːsɪv, US -ˈkɜːrs-/ *adjective*
1 بلاو، لێک‌بلاو، لادەرانە، پرش‌وبلاو 2 (کۆن، فەلسەفە) بەلگەهێنانەوەیی، بەلگەیی: *-scursive practices* ۞ 1 پراکندە 2 برهانی، استدلالی

**discursively** /dɪsˈkɜːsɪvli, US -ˈkɜːrs-/ *adverb*
بە شێوەیەکی لێک‌بلاو ۞ بە طور پراکندە

**discursiveness** /dɪsˈkɜːsɪvnəs, US -ˈkɜːrs-/ *noun*
لێک‌بلاوی، بلاوی، پرش‌وبلاوی ۞ پراکندگی

**discus** /ˈdɪskəs/ *noun, pl.* discuses
1 (وەرزش) پەپکە، ئالقەی ئاسن، سێلک 2 هاوێشتنی پەپکە، پەپکەهاوێژی 3 جۆرێ ماسیلکەی رەنگینی ئەمریکای باشووری، ماسی‌پەپکە [توخم *Symphysodon*: چەندین جۆرن] (بە ریگای لاتین لە *diskos* یۆنانی) ۞ 1 دیسک 2 پرتاب دیسک 3 دیسکوس

**discussable** *adjective*, also discussible
شیاوی وتوویژ، شیاوی دان‌وستان یان گفت‌وگۆ، بۆ دان‌وستان دەبێ، لەلێدوان‌هاتوو ۞ قابل بحث

**discussion** /dɪˈskʌʃn/ *noun*
وت‌وویژ، هەڤپەیڤین، راگۆڕینەوە، دان‌وستان، گفت‌وگۆ، لێدوان: *a topic/subject for discussion* ۞ گفت‌وگو، بحث، مذاکرە

**disdain** /dɪsˈdeɪn/ *noun*
1 سووکایەتی، بێ‌ڕێزی‌پێ‌کردن، بەهێچ‌دانان: *to treat sb with -dain* 2 رق‌لێ‌بوون، بێزکردنەوە، بێزاری ۞ 1 اهانت، خوارشماری 2 نفرت

**disdainful** /dɪsˈdeɪnfl/ *adjective*
1 سووکانە، سووکایەتی‌یانە، لووت‌بەرز، بەفیز، فیزن، 2 dismissive ,contemptuous ,proud بێزار ۞ 1 اهانت‌آمیز 2 متنفر

**disdainfully** /-fəli/ *adverb*
بە شێوەیەکی سووکانە، سووکانە ۞ بە طور اهانت‌آمیز

**disdainfulness** /dɪsˈdeɪnflnəs/ *noun*
رق‌لێ‌بوون، بێزکردنەوە، بێزاری ۞ تنفر

**disease** /dɪˈziːz/ *noun*
نەخۆشی، ناساخی، دەرد، عیلەت (بنەرەت: ئینگلیسی نێوەراست "نەبوونی ئاسوودەیی ease، نارەحەتی "inconvenience": لە *desaise* فەرەنسی کۆنەوە "نەبوونی ئاسوودەیی، نائاسوودەیی") ۞ بیماری، مرض

**diseased** /dɪˈziːzd/ *adjective*
1 نەخۆش، ناساخ 2 (خوازە) نەخۆش، خراپ، عەیب‌دار 3 (گیا) ئازاراوی، ئازاربردوو، ئازاربردە، ئافەتاوی، ترترەخواردوو ۞ 1 بیمار 2 (مجازی) معیوب 3 آفت‌زدە

**disembarkation** /ˌdɪsˌembɑːˈkeɪʃn, US -bɑːrˈk-/ *noun*
1 دابەزین، پیادەبوون، دابەزاندن، پیادەکردن 2 داگرتن، خاڵی‌کردن، بەتاڵ‌کردن ۞ 1 پیادە شدن، پیادە کردن 2 تخلیە

**disembarrassment** *noun*
1 رزگاربوون، دەربازبوون 2 لێ‌بوونەوە، سەرسووکی ۞ 1 رهایی 2 فراغت

**disembodied** /ˌdɪsɪmˈbɒdid, US -ˈbɑːdid/ *adjective*
1 (گیان یان رۆح) لە لەش‌چووەدەر، ئازاد (لە لەش) 2 (خوازە) نەناسراو، ناناشکرا، نەزانراو ۞ 1 از بدن آزادشدە 2 (مجازی) ناشناختە

**disembodiment** *noun*
لە لەش‌دەرچوون، ئازادبوون (لە لەش)، جیابوونەوە لە لەش، رەهابوون لە لەش ۞ آزادشدن از بدن

**disembowelment** *noun*
ریخۆڵەدەرهێنان، زگ‌هەڵدڕین، هەناودەرکێشان ۞ بیرون‌ریزی رودە

**disempowerment** *noun*
لاوازاندن، بێ‌هێزکردن، ستاندن، هێزچنین ۞ تضعیف

**disenchanted** /ˌdɪsɪnˈtʃɑːntɪd, US -ˈtʃænt-/ *adjective*
دڵسارد، بێ‌هیوا، تێر، بێزراو ۞ مأیوس، دلزدە

**disenchantment** *noun*
ناهومێدی، دڵساردی، بێ‌هیوایی، سەر لە عەرزکەوتوویی ۞ یأس

**disencumbrance** *noun*
رزگاربوون، دەربازبوون، ئازادبوون، لێ‌بوونەوە، خلاس‌بوون ۞ رهایی

**disfranchised** *adjective*
بێ‌بەش لە ماف، بێ‌بەری لە ماف، لە ماف‌کراو (ب.ت. دەنگ‌دان) ۞ محروم از حق

**disenfranchisement** *noun*
بێ‌بەش‌کردن لە ماف، لە ماف‌کردن، بێ‌بەری‌کردن لە مافی دەنگ‌دان ۞ محرومیت از حق (رأی)، محرومیت

**disengaged** *adjective*
1 ئازاد، دەس‌بەتاڵ، بێکار، ئاسوودە، سەرسووک، رەها، لێوەبوو، بێ‌ئەرک 2 نەگیراو، خاڵی، بەتاڵ ۞ 1 فارغ، آزاد 2 خالی

**disengagement** *noun*
1 رزگاربوون، دەربازبوون، لێ‌بوونەوە، خلاس‌بوون، دەس‌بەتاڵی، بێکاری، ئازادی، سەرسووکی 2 جیاکردنەوە، هەڵپچڕین 3 پاشەکشێ، شەڕبڕینەوە ۞ 1 رهایی، فراغت 2 جداسازی 3 عقب‌نشینی

**disentailment** *noun*
(مـاف، مـاڵ و دارایـی) رزگـارکردن، رەهـاکردن، ئازادکردن، دەربازکردن ◌ آزادسازی

**disentanglement** *noun*
1 کرانەوە، رەوانەوە، رەهـابوون 2 رزگـارکردن، رەهـــاکردن، دەربـــازکردن، ئـــازادکردن ◌ 1 بازشدگی 2 آزادسازی

**disequilibrium** /ˌdɪsˌiːkwɪˈlɪbriəm, US ˌdɪsˌek- *noun*
1 ناهاوسەنگی، لاسەنگی، ناهاوکێشی، ترازاوی، ناڵەنگەری 2 ناجێگیری، ناسەقامگرتوویی ◌ 1 عدم تعادل 2 بی‌ثباتی

**disestablishment** *noun*
لـە دەوڵـەت یـان حکومـەت جیاکردنـەوە، لـە فەرمیبوون خستن (کلێسە) ◌ غیررسمی‌سازی

**disesteem** /dɪsəˈstiːm/ *noun*
1 بـــێ‌بـــاوەڕی، بـــێ‌بـــڕەوی، بـــێ‌بایـــەخی، ســـووک‌کـــردن، بـــەهیچ‌دانـــان 2 بێـــزاری ◌ 1 بی‌اعتباری، دون‌شماری 2 تنفر

**disfavour** /dɪsˈfeɪvə(r)/ *noun*, US disfavor
بـێ‌مـەیلی، سـاردوسـڕی، لەبەرچاوکـەوتوویی، تووڕەیی، خۆش‌نەویستن، رقلێبوون، بێزاری ◌ بی‌لطفی، غضب، نارضایی

**disfellowship** *noun*
لە ئەندامێتی خستن ◌ اخراج (از عضویت)

**disfigured** *adjective*
ناحـــەز، ناشـــیرین، نارێـــک، تێکچـــوو، شـــپرزە، لەشێوەکەوتوو ◌ بدریخت، زشت

**disfigurement** *noun*
1 ناحـــەزی، ناشـــیرینی، نـــارێکی، تێکچـــوویی، شپرزەیی، لەشێوەکەوتوویی 2 (لە سەروچاودا) عەیب ◌ 1 بدریختی، زشتی 2 نقص

**disfranchisement** = disenfranchisement

**disgorgement** *noun*
1 هێنانەوە، رشانەوە، قەرەشیان، پەرۆش‌کردن 2 گێڕانەوە، دانەوە، رەت‌کردنەوە ◌ 1 استفراغ 2 استرداد

**disgorger** *noun*
قولاپ‌دەرهێن، قولاپ‌ڕەوێن (لە دەمی ماسی) ◌ دیس‌گورگر

**disgrace** /dɪsˈɡreɪs/ *noun*
1 بـــێ‌ئابـــڕوویی، ئابـــڕووچوویی، شـــوورەیی، نـــاوزڕاوی، ســـووکی، رووڕەشـــی، رووســـیاباری، شـوورەیی، نەنگ، عەیب، مایەی ئابڕووچوون، مایەی شوورەیی یا شەرم 2 بێ‌مەیلی، ساردوسڕ 3، تووڕەیی، رق‌هەستاوی ◌ 1 رسوایی، خفت، بدنامی، مایەی بدنامی 2بی‌محبتی 3 مغضوبیت، خشم

**disgraced** *adjective*
بـێ‌ئابـڕوو، ئابـڕووچوو، نـاوزڕاو، رووسـیابار، سووک، ترۆ، چرووک، رووڕەش ◌ بدنام، رسوا

**disgraceful** /dɪsˈɡreɪsfl/ *adjective*
ناحەز، خراپ، ناشیرین، ئابڕووبەرە، شـەرماوی، رووڕەشی دێنێ، عەیب، بەشوورەیی ◌ ننگین، رسواکننده

**disgracefully** /-fəli/ *adverb*
بە شێوەیەکی شـەرماوی، ئابڕووبەرانە، عەیبانە ◌ به طور ننگین

**disgruntled** /dɪsˈɡrʌntld/ *adjective*
ناقایل، ماسیو، بەبۆڵەبۆڵ، وەڕەز، جاڕز، زیز ◌ ناراضی، دلخور

**disguise** /dɪsˈɡaɪz/ *noun*
1 خۆگۆڕین 2 جلوبەرگی خۆگۆڕین 3 قیافە یان رواڵەتی خۆگۆڕیو ◌ 1 تغییر قیافه 2 لباس مبدل 3 ظاهر مبدل

**disgust** /dɪsˈɡʌst/ *noun*
1 بێزاری، رقلێبوون، قێنلێبوون، نەفرین، ناخۆش‌ویستن 2 دڵێکاهاتن، دڵ‌تێکەڵهاتن، حاڵەتی رشانەوە یان پەرۆش‌کردن ◌ 1 تنفر، انزجار 2 دل بەهم‌خوردگی

**disgusted** /dɪsˈɡʌstɪd/ *adjective*
بێـــزار، بێـــزراو، رقلـــێبـــوو، قـــێنلـــێبـــوو، ناخۆش‌ویستوو، لاڵووت ◌ متنفر

**disgustedly** /dɪsˈɡʌstɪdli/ *adverb*
لە رووی رقەوە، بە شێوەیەکی بێزار، لە رووی بێزارییەوە ◌ از روی تنفر

**disgusting** /dɪsˈɡʌstɪŋ/ *adjective*
قێزەون، بێزاوی، مایەی بێزاری، وەی، پیس، ناحەز، شپرزە، ناخۆش، رشێنەرەوە، :revolting ◌ نفرت‌انگیز *What a disgusting smell!*

**disgustingly** /dɪsˈɡʌstɪŋli/ *adverb*
1 بە شێوەیەکی بێزاوی: *disgustingly dirty* 2 (نافەرمی) یەکجار ◌ 1 بـە طـور نفـرت‌انگیـز 2 (عامیانه) فوق‌العاده

**dish** /dɪʃ/ *noun*
1 قاپ، دەوری، کاسە، جام، بایە: *a glass dish* ◊ *an ovenproof dish* ◊ *They helped themselves from a large dish of pasta* 2 چێشت، نان، خۆراک 3 ئانتێنی کاسەیی، سێڵ یـان سـاج 4 (نافـەرمی) تیکـە، جـەرگ، لـەبار، سێکـسی: *What a dish!* 5 (تەکنیکی) قـاپ، جـــام 6 (the dishes) قـــاپوکـــەوچک، قـاپوقاچـاخ، هێربـار، حاجـەت ◌ 1 ظـرف، بشقاب 2 غذا 3 آنتن بشقابی 4 (عامیانـه) لعبـت 5 قاب 6 (در جمع) ظروف

**dishabille** /ˌdɪsaˈbiːl, US -ˈbiː/ = déshabillé

**dish aerial** *noun*, also dish antenna
ئانتێنی کاسەیی، ساج، سێڵ ◌ آنتن هوایی

**disharmonious** /ˌdɪʃɑːˈməʊnɪəs/ *adjective*, also disharmonic
نـــاکۆک، نەســـازاو، ناســـاز، ناتـــەبا، نـــاجۆر، یـەک‌نەکـەوتوو، کێشاوی، سەربەکێشە، لەگەڵ

کێشە ◌ ناموزون، ناهماهنگ

**disharmony** /dɪsˈhɑːməni, US -ˈhɑːrm-/ *noun*

دژایەتی، کێشە، دووبەرەکایەتی، ناکۆکی، ناسازی، نەگونجاوی، ناتەبایی، یەکنەکەوتوویی، ڕێکنەکەوتوویی، تێکگیراوی: - *marital/racial/social harmony* ◌ عدم توافق، ناسازگاری، ناهماهنگی

**dishcloth** /ˈdɪʃklɒθ, US -klɔːθ/ *noun*

هەوری قاپشتن، قاپشۆر، کاسەشۆر ◌ اسکاج

**dishcloth gourd** = loofah

**dishdasha** /ˈdɪʃˌdaʃə/ *noun*, also dishdash

جۆرێ عابای قۆڵدرێژ، پیاوانی شامات لەبەری دەکەن ◌ دیشداشا

**disheartened** *adjective*

ناهومێد، دڵسارد، باڵشکاو، سەربەبەرداکەوتوو ◌ ناامید، مأیوس

**disheartening** / dɪsˈhɑːtnɪŋ, US -ˈhɑːrt-/ *adjective*

دڵساردکەرەوە، ناهومێدکەر، هیوابڕ: *a -tening experience* ◌ یأس‌آور

**dishearteningly** *adverb*

بە شێوەیەکی دڵساردکەرەوە، هیوابڕانە ◌ بە طور یأس‌آور

**dishevelled** /dɪˈʃevld/ *adjective*, US disheveled

شێواو، ئاڵۆزاو، ئاڵۆسکاو، شێرزە، شڕوشێواو، شەپریو، شڵوشێواو: *He looked tired and dishevelled* ◌ ژولیده، نامرتب

**dishevelment** *noun*

شێواوی، ئاڵۆزاوی، ئاڵۆسکاوی، شێرزەیی، شەپریوی، شڕوشێواوی، تێکچوویی ◌ ژولیدگی، آشفتگی

**dishful** *noun. pl.* dishfuls

پڕدەوریێ، دەوریێ ◌ بە اندازەی یک بشقاب

**dishonest** /dɪsˈɒnɪst, US -ˈɑːn-/ *adjective*

1 نادروست، ناڕاست، دەسپیس، حەرامخۆر، دەسدرێژ، سەرچەوت، دەسچەوت، ناپاک، دەغەڵ، فێڵاوی، زۆڵ، نائەمین 2 فێڵەبازانە، فریودەرانە، دەسبڕانە، فێڵاوییانە 3 (پارە، داهات و هتد) نارەوا ◌ 1 دغل، متقلب، غیرامین، نادرست 2 تقلب‌آمیز 3 نامشروع

**dishonestly** /dɪsˈɒnɪstlɪ, US -ˈɑːn-/ *adverb*

دەغەلانە، فێڵاوی، زۆڵ، نائەمین، فێڵەبازانە، فریودەرانە ◌ متقلبانە

**dishonesty** /dɪsˈɒnɪstɪ/ *noun*

نادروستی، ناڕاستی، دەسپیسی، حەرامخۆری، دەسدرێژی، سەرچەوتی، دەسچەوتی، ناپاکی، دەغەلی، فروفێڵ، زۆڵی: *Five civil servants were dismissed for dishonesty and misconduct* ◌ دغلی، تقلب، نادرستی

**dishonour** /dɪsˈɒnə(r), US -ˈɑːn-/ *noun*, US dishonor

بێئابڕوویی، ئابڕووچوویی، حەیاچوون، سووکی، ئاوزڕاوی، ڕووڕەشی، شوورەیی، نەنگ، عەیب، مایەی ئابڕووچوون، مایەی شوورەیی ◌ رسوایی، خفت، بدنامی، مایەی بدنامی

**dishonourable** /dɪsˈɒnərəbl, US -ˈɑːn-/ *adjective*

ناحەز، شەرماوی، شوورەیی، عەیب، ئابڕووبەرە، سووک، خراپ، خوێڕی، ناپیاو، بێئابڕوو، ناپیاو، نزم، سووکوچرووک، *dishonorable* :shameful *conduct* ◌ ننگین، زشت، پست، بی‌شرف

**dishonourably** /-nərəbli/ *adverb*

ئابڕووبەرانە، شوورەیییانە، سووکانە ◌ بە طور ننگین

**dishpan** /ˈdɪʃpæn/ *noun*

کاسە یا تەشتی قاپشتن ◌ کاسەی ظرف‌شویی

**dishrag** /ˈdɪʃræg/ = dishcloth

**dishtowel** /ˈdɪʃtaʊəl/ *noun*

دەسرە یان پەڕۆی (وشککردنەوە یان سڕینی) قاپوکەوچک ◌ دستمال ظروف

**dishwasher** /ˈdɪʃwɒʃə(r), US -wɑːʃ-, -wɔːʃ-/ *noun*

دەزگای قاپشتن، قاپشۆر(ە) ◌ ماشین ظرف‌شویی

**dishwashing liquid** *noun*

کەفاوی قاپشۆری یان قاپشتن، شلە یان سابووناوی قاپشتن ◌ مایع ظرف‌شویی

**dishwater** /ˈdɪʃwɔːtə(r)/ *noun*

1 ئاوی قاپشتن، چڵکاو 2 (خوازە و نافەرمی) مێزەکەر، چڵکاو ◌ 1 آب ظرف‌شویی 2 (عامیانە) آب زیپو

**dishy** /ˈdɪʃi/ *adjective* (dishier, dishiest)

1 (نافەرمی) سەرنجڕاکێش، جوان، لەبار، جەرگ 2 جێی شەرم، مایەی سەرشۆڕی، شەرماوی، ئابڕووبەرە ◌ 1 جذاب، تیکە 2 ننگ‌آور

**disillusion** /ˌdɪsɪˈluːʒn/ *noun*

1 ڕزگارکردن یان ڕەخساندن لە خەیاڵ(وخۆف)، ئاگادارکردنەوە 2 ناهومێدی، دڵساردی، هیوابڕاوی ◌ 1 توهم‌زدایی 2 یأس

**disillusioned** /ˌdɪsɪˈluːʒnd/ *adjective*

ناهومێد، دڵسارد، تێشکاو، دڵشکست، باڵشکاو، بێهیوا ◌ ناامید، مأیوس

**disillusionment** /ˌdɪsɪˈluːʒnmənt/ *noun*, also disillusion

ناهومێدی، دڵساردی، تێشکاوی، دڵشکستی، باڵشکاوی، بێهیوایی. :disenchantment *There is widespread disillusionment with the present government* ◌ یأس، ناامیدی

**disincentive** /ˌdɪsɪn'sentɪv/ *noun*
1 مایەی دڵساردبوونەوە، مایەی ناهومێدی یان دڵشکستی 2 کۆسپ، مایەی داشکان، deterrent ◌ 1 مایەی ناامیدی 2 عامل بازدارنده

**disinclination** /ˌdɪsˌɪnklɪ'neɪʃn/ *noun*, also reluctance
بێمەیلی، بێخۆشنەبوون، نەخوازی، نابەدڵێتی، وەڕەزبوون، ساردی، دڵتێنەچوون، مەیلێنەبوون، ئیشتیالێنەبوون، دەستێنەچوون ◌ اکراه، عدم تمایل

**disinclined** /ˌdɪsɪn'klaɪnd/ *adjective*
بێمەیل، سارد، بەدڵتێوەنەچوو، بێدڵ، نابەدڵ، نەخواز ◌ بی‌میل

**disinfectant** /ˌdɪsɪn'fektənt/ *noun, adjective*
*n* مەتریالی پاکژکردنەوە، ماک یان مادەی خاوێنکەرەوە *adj* خاوێنکەرەوە، پاکژکەرە ◌ *n* مادەی ضدعفونی *adj* ضدعفونی

**disinfection** /ˌdɪsɪn'fəkʃn/ *noun*
پاکژکردنەوە، خاوێنکردنەوە، گەندکوژی ◌ ضدعفونی

**disinfectant** /ˌdɪsɪn'fektənt/ *noun, adjective*
(دەرمانی) پاکژکردنەوە یان خاوێنکردنەوە، (دەرمانی) گەندکوژ ◌ (داروی) ضدعفونی

**disinfestant** *adjective*
مێرووکوژ، ئافەتکوژ، مێرووفەوتێن ◌ آفت‌زدا، حشره‌زدا

**disinfestation** *noun*
مێرووکوژی، ئافەتکوژی، دەرمانلێدان ◌ حشره‌زدایی، آفت‌زدایی

**disinflation** *noun*
(ئابووری) مەهار یان کۆنترۆلی هەڵاوسان، کەمکردنەوەی ڕێژەی هەڵاوسان ◌ تورم‌زدایی

**disinformation** /ˌdɪsˌɪnfə'meɪʃn, US -fər'm-/ *noun*
زانیاری درۆ یان چەواشە (چەوت)، زانیاری فریودەر، بڵاوکردنەوەی زانیاری چەواشە یان فریودەر (ب.ت. لە بواری سیاسەتدا) ◌ اطلاعات دروغ، نشر اطلاعات دروغ یا گمراه‌کننده

**disingenuous** /ˌdɪsɪn'dʒenjuəs/ *adjective*
ڕیاییباز، دووڕوو، فێڵاوی، بەمەڕایی، مەراییباز، ڕیاییبازانە، دووڕووانە ( disingenuousness /ˌdɪsɪn'dʒenjuəsnəs/ *n*: ڕیاییبازی، دووڕوویی، فێڵاویبوون، مەڕایی، ڕیایی، ڕووبامایی) ◌ ریاکار، مزورانه

**disingenuously** /ˌdɪsɪn'dʒenjuəsli/ *adverb*
ڕیاییبازانە، دووڕووانە ◌ ریاکارانه، مزورانه

**disinheritance** /ˌdɪsɪn'herɪtəns/ *noun*
بێبەریبوون، بەشبڕان، بێبەریکردن (لە میرات یان بەشەماڵ: disinherited *adj*: بێبەری(کراو)، بەشبڕاو، بێبەشکراو) ◌ محرومیت یا محروم‌سازی از ارث

**disintegration** /dɪsˌɪntɪ'greɪʃn/ *noun*
شیبوونەوە، لێکهەڵوەشان، هەڵوەشانەوە، پارچەپارچەبوون، پووان، (پرش و) بڵاوبوونەوە، لێکبوونەوە، وردوخاشبوون، لەتوکوتبوون ◌ تجزیه، فروپاشی، تلاشی

**disinterest** /dɪs'ɪntrəst, US -trest/ *noun*
1 بێمەیلی، بێخۆشنەبوون، ئیشتیالێنەبوون، ساردی، کەمتەرخەمی، بێخەیاڵی، گوێپێنەدان، پشتگوێخستن 2 بێلایەنی، لانەگری، تێوەنەگلاوی ◌ 1 بی‌میلی، بی‌اعتنایی 2 بی‌طرفی

**disinterested** /dɪs'ɪntrəstɪd, US -trestɪd/ *adjective*
1 بێلایەن، لانەگر، بێلایەنانە، پاکانە 2 کەمتەرخەم، بێمەیل، بێخەیاڵ، بێتەماح، سارد ◌ 1 بی‌طرف، بی‌طرفانه 2 بی‌تفاوت

**disinterestedly** /dɪs'ɪntrəstɪdli, US -trestɪdli/ *adverb*
1 بێلایەنانە، لانەگرانە 2 کەمتەرخەمانە ◌ 1 بی‌طرفانه 2 با بی‌اعتنایی

**disinterestedness** /dɪs'ɪntrəstɪdnəs, US -trestɪdnəs/ *noun*
1 بێلایەنی، لانەگری 2 کەمتەرخەمی، ناتامەزرۆیی، بێمەیلی، بێتەماحی، بێخەیاڵی، ساردی ◌ 1 بی‌طرفی 2 بی‌اعتنایی

**disinterment** /ˌdɪsɪn'tɜ'(r)mənt/ *noun*
گۆڕدانەوە، قەبردانەوە، قەبرهەڵکەندن، دەرهێنان، گۆڕبەگۆڕکردن ◌ نبش قبر

**disinvestment** /ˌdɪsɪn'vestmənt/ *noun*
سەرمایەهەڵگرتنەوە، سەرمایەکێشانەوە، فرۆشتنی بەشەکانی کۆمپانی و هتد ◌ سرمایه‌گذاری منفی

**disjointed** /dɪs'dʒɔɪntɪd/ *adjective*
شێواو، ئاڵۆز، شپرزە، بێسەروبەر، سەرێەکنەچووەوە، لێکبڵاو، پەرت، ترازاو: *a disjointed society* ◌ نامربوط، آشفته، پراکنده

**disjointedly** /dɪs'dʒɔɪntɪdli/ *adverb*
شێواوانە، بە شێوەیەکی بێسەروبەر، بە شێوەیەکی ئاڵۆز یان شێواو ◌ به طور نامربوط

**disjointedness** /dɪs'dʒɔɪntɪdnəs/ *noun*
شێواوی، ئاڵۆزی، شپرزەیی، بێسەروبەرەیی، لێکبڵاوی، پەرتی، ترازاوی ◌ آشفتگی، پراکندگی

**disjunct** /'dɪsdʒʌŋ(k)t/ *adjective*
1 (ڕێزمان) = sentence adverb 2 شێواو، ئاڵۆز، شپرزە، بێسەروبەر، لێکبڵاو، پەرت، ترازاو ◌ نامربوط، آشفته، پراکنده

**disjunction** /dɪs'dʒʌŋkʃn/ *noun*
1 جیابوونەوە، لێکدابڕان، دابڕان، لێکڕەوینەوە،

لێک‌هەڵبچڕان 2 جیاکردنەوە، دابڕین، لێک‌کردن ◌ 1 انفصال، گسستگی 2 تفکیک

**disjunctive** /dɪs'dʒʌŋktɪv/ *adjective, noun*
*adj* 1 جیا، لێک‌دابڕاو، دابڕاو، لێک‌کراو، لێک‌هەڵبچڕاو 2 جیاکەرەوە، لێک‌دابڕ *n* 1 *adj* ◌ disjunctive conjunction گسسته، منفصل 2 فاصل

**disjunctive conjunction** *noun*
(ڕێزمان) پیتێ کە بژارە choice یان دژایەتی نێوان دوو بیر و بۆچوون دەردەبڕێ (وەک or، وەک *she asked if he was going or staying*) ◌ حرف استثنا

**disjuncture** *noun*
1 دابڕان، پچڕان، ڕۆیشتن، هەڵبڕان 2 دابڕین، هەڵبڕین، لێک‌کردنەوە، جیاکردنەوە ◌ 1 قطع 2 جداسازی

**disk**[1] = disc

**disk**[2] /dɪsk/ *noun*
(کامپیوتێر) پەپکە، سێلک (*diskless adj*) ◌ دیسک

**disk drive** *noun*
پەپکەسووڕێن، سێلک‌گەڕێن، سێلکاژۆ، درایڤی دیسک ◌ دیسک‌گردان

**diskette** /dɪs'ket/ *noun,* also floppy
دیسکێت، فلاپی، نەرمەسێلک، نەرمەپەپکە ◌ دیسکت

**dislike** /dɪs'laɪk/ *noun*
ناخۆش‌ویستن، ڕق‌لێ‌بوون، قین‌لێ‌بوون، چاوپێ‌هەڵنەهاتن ◌ تنفر

**dislocated** *adjective*
1 (ئێسک) لەجێ‌چوو، وەرگەڕاو، خەلیابوو 2 هەڵوەشاو، شێواو، شلەژاو، تێکچوو ◌ 1 دررفته 2 مختل، بهم‌خورده

**dislocation** /ˌdɪslə'keɪʃn, US -loʊ-/ *noun*
1 لەجێ‌چوون، وەرگەڕان، خەلیان 2 هەڵوەشان، تێکچوون، شلەژان، شێوان ◌ 1 دررفتگی 2 بهم‌ریختگی، اختلال

**dislodgement** *noun,* also dislodgment
1 دەرکردن، وەدەرنان، لابردن 2 هەڵکەنراوی، هەڵتەکاوی ◌ 1 اخراج 2 ازجاکنده‌شدگی

**disloyal** /dɪs'lɔɪəl/ *noun*
خەیانەت‌کار، ناپاک، نهێنی‌بڕ، بێ‌بەڵێن، پەیمان‌شکێن، بێ‌ئەمەک، پێنەزان، سپڵە، بێ‌سەفەت ◌ خائن، بدعهد، بی‌وفا

**disloyally** /dɪs'lɔɪəli/ *adverb*
خەیانەت‌کارانە، ناپاکانە، خاینانە ◌ خائنانه

**disloyalty** /-'lɔɪəlti/ *noun*
خەیانەت، ناپاکی، پەیمان‌شکێنی، بێ‌ئەمەکی، بێ‌سەفەتی، ناسپاسی، پێنەزانی، سپڵەیی، بێ‌وەفایی ◌ خیانت، بدعهدی، بی‌وفایی

**dismal** /'dɪzməl/ *adjective*
1 خەمبار، دڵتەنگ، نارەحەت، پەژارەبار، کز 2 نارەحەت‌کەر، دڵتەنگ‌کەر: *dismal conditions/surroundings/weather* 3 خراپ، شپرزە، ناخۆش (لە *dismals*، دوو ڕۆژی هەر مانگ کە لە سەدەکانی نێوەڕاست واباوەڕ بووە کە نەگریس بن، لە *dis mal* فەرەنسەی ئانگلۆنۆرمانی، لە *dies mali* لاتین "ڕۆژانی شەیتانی") ◌ 1 غمگین 2 غم‌انگیز 3 بد

**dismally** /-məli/ *adverb*
1 دڵتەنگ‌کەرانە، نارەحەت‌کەرانە 2 بە شێوەیەکی خراپ: *I tried not to laugh but failed -ally* ◌ 1 به طور غم‌انگیز 2 به طور بد

**dismantlement** /dɪs'mætlmənt/ *noun*
1 ڕووت‌کردنەوە، داڕووتاندن 2 هەڵوەشاندن، کردنەوە، پارچەپارچەکردن ◌ 1 برهنه‌سازی 2 عمل بازکردن

**dismay** /dɪs'meɪ/ *noun*
1 ترس، نیگەرانی، نارەحەتی، دڵەڕاوکێ: *She could not hide her dismay at the result* ◊ 2 ناهومێدی، *He looked at her in dismay* دڵساردی ◌ 1 وحشت، دلواپسی 2 یأس

**dismayed** *adjective*
ترساو، تۆقیو، نیگەران، نارەحەت ◌ وحشت‌زده، نگران

**dismemberment** *noun*
1 بڕینی دەست و پێ، پەل‌کردن، تیکەتیکەکردن (مرۆڤ یان گیانەوەر) 2 (وڵات و هتد) پارچەپارچەکردن، لەتاندن، هەڵوەشاندن، دابەش‌کردن 3 (زەوی‌وزار) پەلەپەلەکردن، پارچەپارچەکردن، بەشاندن، دابەش‌کردن، دابردابڕکردن، کەرت‌کەرت‌کردن 4 جیابوونەوە، دابڕان ◌ 1 قطع دست و پا 2 تجزیه 3 تفکیک 4 انفصال

**dismissal** /dɪs'mɪsl/ *noun,* also dismission
1 دەرکردن، دەرنان، لابردن، لەسەر کارلابردن، وەلانان 2 بەرپەرچ‌دانەوە، نکۆڵی‌(لێ‌کردن)، ڕەدکردنەوە: *the dismissal of the appeal* 3 ناردنەوە، مۆڵەت‌پێدان، مەرەخەسی 4 ئازادی، ئازادکردن، بەرەڵاکردن ◌ 1 اخراج، عزل 2 رد 3 مرخصی 4 آزادی، آزادکردن

**dismissive** /dɪs'mɪsɪv/ *adjective*
کەمتەرخەم، بێ‌خەیاڵ، ساردوسڕ، نادەربەست، لامسەرلا، گوێ‌پێ‌نەدەر: *a dismissive gesture/tone* ◌ بی‌اعتنا

**dismissively** /dɪs'mɪsɪvli/ *adverb*
کەمتەرخەمانە، ساردوسڕانە: *to shrug/wave -issively* ◌ با بی‌اعتنایی

**disobedience** /ˌdɪsə'biːdiəns/ *noun*
سەربزێوی، بێ‌گوێیی، یاخی‌گەری، سەربەرزکردنەوە، کەلەگایی، سەرچەوتی، نافەرمانی، بێ‌ئەمری، ملبادان، سەرپێچی،

ناگوێڕایەڵی ◊ تمرد، نافرمانی، عدم اطاعت

**disobedient** /ˌdɪsəˈbiːdiənt/ *adjective*
سەربزێو، کەڵەگا، بێگوێ، یاخی، سەرچەوت، سەرپێچ، سەرپێچیکەر، نافەرمان، بێنەمر، ناگوێڕایەڵ ◊ متمرد، سرکش، نافرمان

**disobediently** /ˌdɪsəˈbiːdiəntli/ *adverb*
سەربزێوانە، یاخیگەرانە، بە یاخیگەری ◊ سرکشانە، با تمرد

**disobliging** /ˌdɪsəˈblaɪdʒɪŋ/ *adjective*
یارمەتینەدەر، یاریدەنەدەر، نادڵسۆز ◊ فاقد حس تعاون یا همکاری

**disorder** /dɪsˈɔːdə(r), US -ˈɔːrd-/ *noun*
1 شێواوی، ئاڵۆزی، شپرزەیی، شڵەژاوی، نارێکوپێکی، تێکەوڵێکەیی، نارێکی 2 ئاڵۆزی، پشێوی، شێواوی، نائارامی، شلوقی، ئاژاوە، سەرهەڵدان، گەرەلاوژە، پاشاگەردانی، ئاخۆران وباخۆران 3 نەخۆشی، نارەحەتی، ناسازی، تێکچوون: *a blood/bowel, etc. disorder* ◊ 1 نابسامانی، آشفتگی، بی‌نظمی 2 آشوب، اغتشاش 3 اختلال، بیماری

**disordered** /dɪsˈɔːdəd, US -ˈɔːrdərd/ *adjective*
1 شێواو، ئاڵۆز، شپرزە، نارێکوپێک، شلوق، تێکەوڵێکە، شڵەژاو، نارێک، پەرێشان، کۆنترۆڵنەکراو 2 نەخۆش، نارەحەت، ناساز: *a disordered state* ◊ 1 بە هەمریختە، نابسامان، آشفته غیرقابل کنترل 2 بیمار

**disorderliness** *noun*
شێواوی، ئاڵۆزی، شپرزەیی، نارێکوپێکی، شڵەژاوی، تێکەوڵێکەیی، نارێکی ◊ آشفتگی، بی‌نظمی

**disorderly** /dɪsˈɔːdəli, US -ˈɔːrdərli/ *adjective*
1 شێواو، ئاڵۆز، شپرزە، نارێکوپێک، شلوق، تێکەوڵێکە، شڵەژاو، نارێک: *newspapers in a disorderly pile by the door* 2 ئاژاوەنەردوە، شێوێنەر، شلوقینەرەوە، گێرەشێوێن ◊ 1 آشفته، بی‌نظم 2 اخلالگر

**disorderly house** *noun*
قومارخانە، قەحبەخانە ◊ قمارخانه، فاحشه‌خانه

**disorganization** /dɪsˌɔːɡənaɪˈzeɪʃn, US -ˌɔːrɡənəˈz-/ *noun*
شێواوی، بێبەرنامەیی، ئاڵۆزی، نارێکی، بێسەروبەرەیی، تێکچوویی، شپرزەیی ◊ آشفتگی، اختلال

**disorganized** /dɪsˈɔːɡənaɪzd, US -ˈɔːrɡ-/ *adjective*
شێواو، بێبەرنامە، نارێک، ئاڵۆز، بێسەروبەرە، شپرزە ◊ آشفته، بی‌نظم

**disorientated** *adjective*, also disoriented or disorienting
گێژ، سەرلێشێواو، سەرلێتێکچوو، کاس، لالێشێواو ◊ سردرگم، گیج

**disorientating** *adjective*
گێژکەر، سەرلێشێوێن، سەرلێتێکدەر، لالێشێوێن ◊ سردرگم‌کننده

**disorientation** /dɪsˌɔːriənˈteɪʃn/ *noun*
گێژی، سەرلێشێواوی، سەرلێتێکچوویی، کاسی، لالێشێواوی ◊ سردرگمی، گیجی

**disparagement** *noun*
سووککردن، سووکایەتی (پێکردن)، شکاندن، بەهیچدانان، تێچاندن، داڕزاندن، ئابڕووبردن، ترۆکردن، خراپەوتن، بایەخپێنەدان، تەوس، نیرادلێگرتن، ڕەخنە (سووکانە) ◊ دون‌سازی، تحقیر، انتقاد

**disparaging** /dɪˈspærɪdʒɪŋ/ *adjective*
سووکانە، ڕەخنەگرانە (لە ڕووی سووکییەوە): *disparaging remarks*

**disparagingly** /dɪˈspærɪdʒɪŋli/ *adv* (بە شێوەیەکی) سووکانە: *He spoke disparagingly of his colleagues* ◊ تحقیرآمیز، انتقادآمیز

**disparaging remarks** *noun*
سووککردن، سووکایەتی (پێکردن)، بەهیچدانان، تێچاندن، داڕزاندن، ئابڕووبردن، ترۆکردن، خراپەوتن، بایەخپێنەدان، نیرادلێگرتن، ڕەخنە ◊ دون‌سازی، تحقیر، انتقاد، مذمت

**disparate** /ˈdɪspərət/ *adjective*
(یەکجار) جیاواز، لێکجیا، یەکنەگرەوە، پێکەوەهەڵنەسەنگێنراو: *a disparate group of individuals* ◊ مختلف، متمایز

**disparity** /dɪˈspærəti/ *noun, pl.* disparities
جیاوازی، یەکنەگرتنەوە، پێکەوەهەڵنەسەنگێنراوی ◊ اختلاف، تمایز

**dispassionate** /dɪsˈpæʃənət/ *adjective*
بێلایەن، ئالینەگر، لانەگر، دروست، بێلایەنانە، لانەگرانە، دروستانە: *taking a calm, dispassionate view of the situation*

**dispassionately** /dɪsˈpæʃənətli/ *adv* (بێلایەنانە، لانەگرانەدروستانە) ◊ بی‌طرف، بی‌طرفانە

**dispatch** /dɪˈspætʃ/ *noun*
1 بەرێکردن، ناردن، شاندن، ڕێخستن، خستنەڕێ، ڕەوانە(کردن)، فڕێ 2 ڕاپۆر، هەواڵ، پەیامی نووسراو، نامە: *dispatches from the war zone* 3 خێرایی، توندی، تاو، تالووکە، پەلە 4 جێبەجێکردن یان کردنی خێرا، ڕاپەڕاندنی دەمودەست 5 کوشتن ◊ 1 اعزام 2 گزارش، خبر، پیغام نوشته 3 شتاب، سرعت 4 اجرا یا انجام سریع 5 قتل

**dispatch box** *noun*
سنووقی بەڵگەنامەی فەرمی ◊ صندوق مدارک رسمی

**dispatcher** /dɪ'spætʃə(r)/ *noun*
بەڕێکەر، ڕێخەر، ڕەوانەکار، ڕەوانەکەر (ماشینەکان یان ماشینی نەخۆشبەر بۆ شوێنێ) ۞ اعزام‌کننده

**dispatch rider** *noun*
نامەبەری مۆتۆڕسوار، راسپێری مۆتۆڕسوار ۞ پیک موتورسوار

**dispeller** *noun*
ڕەوێنەر، پەرش‌وبڵاوکەرەوە ۞ برطرف‌ساز، متفرق‌ساز

**dispensable** /dɪ'spensəbl/ *adjective*
1 ناپێویست، ناسەرەکی، نابنەرەتی 2 بۆ لێ‌خۆش‌بوون یان چاوپۆشین دەبێ، شتێکی وا نییە ۞ 1 غیرضروری 2 صرف‌نظرکردنی

**dispensary** /dɪ'spensəri/ *noun, pl.* dispensaries
1 دەرمانخانە، دەواخانە 2 شوێنی دەرمانکردن، تیمارگە، کلینیک ۞ 1 داروخانە 2 بهداری، درمانگاه

**dispensation** /ˌdɪspen'seɪʃn/ *noun*
1 بەشینەوە، دابەش‌کردن، دابەشاندن، بڵاوکردنەوە، دالبەخش(کردن)، بەش‌بەش‌کردن 2 پێدان 3 ویستی خودا، چارەنووس 4 دەسەلات، زاڵێتی 5 جێبەجێ‌کردن، ڕاپەڕاندن، بەڕێوەبردن، دامەزراندن، سەقامگیرکردن 6 دەستوور 7 بەخشراوی، جەبە 8 سیستم یان دەزگای دینی (باو لە هەر سەردەم و قۆناخێکدا) ۞ 1 توزیع، تقسیم، پخش 2 اعطا 3 خواست خدا 4 اقتدار 5 اعمال 6 اجازه 7 معافیت 8 نظام دینی

**dispensational** *adjective*
سەربە dispensation ۞ وابسته به dispensation

**dispensator** *noun*
دابەش‌کەر، دابەشێنەر، بڵاوکەرەوە، دابەش‌گەر ۞ موزع

**dispensatory** /dɪ'spensətəʊri/ *noun, pl.* dispensatories
دەرماننامە (= چۆنیەتی گرتنەوەی دەرمان و بەکارهێنانی) ۞ قرابادین

**dispenser** /dɪ'spensə(r)/ *noun*
1 دەرمانساز، دەرمانگرەوە 2 دەزگای بڵاوکردنەوە، بدەر، دوگمەیی: *a soap dispenser* ۞ 1 داروساز 2 ماشین توزیع، فشاری

**dispensing chemist** *noun*
(بریتانیا) دەرمانساز، دەرمانگرەوە ۞ داروساز

**dispersal** /dɪ'spɜːsl, US dɪ'spɜːrsl/ *noun*
1 بڵاوبوونەوە، پەرش‌بوون، تەنینەوە، پەرت‌بوون، پەراگەندەیی، پرژاندن، تەقەتێ‌کەوتن 2 وەشاندن، ڕەواندن، بڵاوپێ‌کردن، پەرش‌وبڵاوبوونەوە، بڵاوکردنەوە، پەراگەندەپێ‌کردن ۞ 1 انتشار، پراکندگی 2 پراکنده‌سازی

**dispersion** /dɪ'spɜːʃn, US dɪ'spɜːrʒn/ *noun*
1 بڵاوبوونەوە، پەرش‌بوون، تەنینەوە، پەرت‌بوون، پرژاندن، وەشان 2 (فیزیک) بڵاوبوونەوە، پەرش‌بوون، پەرشی، پەرت‌بوون (ی ڕووناکی) ۞ 1 انتشار، پراکندگی 2 (فیزیک) تجزیه، پاشیدگی

**the Dispersion** = the Diaspora

**dispersion force** *noun*
هێزی بڵاوکردنەوە یا پەرشی ۞ نیروی پراکندگی

**dispersion formula** *noun*
شێوگ یان فۆرمولی بڵاوبوونەوە ۞ فرمول پراکندگی

**dispirited** /dɪ'spɪrɪtɪd/ *adjective*
1 هیوابڕاو، ناهومێد، دڵسارد 2 خەمبار، دڵتەنگ، بێ‌کەیف، کز، مات، نارەحەت، بێ‌دەماخ، سارد، دڵتەنگانە، ساردوسڕانە، خەمبارانە 3 دڵساردانە ۞ 1 مأیوس 2 غمگین، افسرده 3 نومیدانه

**dispiritedly** /dɪ'spɪrɪtɪdli/ *adverb*
1 هیوابڕانە، دڵساردانە، ناهومێدانە 2 خەمبارانە، بە کزی‌یەوە، مات، دڵتەنگانە ۞ 1 مأیوسانه 2 با غمگینی

**dispiritedness** *noun*
1 ناهومێدی، دڵساردی، بێ‌هیوایی 2 دڵتەنگی، خەمباری، ماتی، کزی، بێ‌دەماخی، بێ‌کەیفی ۞ 1 یأس 2 غمگینی، افسردگی

**dispiriting** /dɪ'spɪrɪtɪŋ/ *adjective*
1 ناهومێدکەر، مایەی ناهومێدی، دڵساردکەرەوە، هیوابڕ، مایەی دڵشکستی: *a dispiriting experience/failure* 2 دڵتەنگ‌کەر، نارەحەت‌کەر (dispiritingly *adv*) ۞ 1 یأس‌آور 2 افسرده‌کننده

**displaced** *adjective*
دەرکراو، وەدەرنراو، پەرتەوازە، ئاوارە، تەرە، هەڵوەدا ۞ رانده‌شده

**displaced person** *noun*
پەنابەر، پەناخواز، هەڵوەدا ۞ پناهنده

**displacement** /dɪs'pleɪsmənt/ *noun*
1 جێ‌گرتنەوە، جێگری، کشاندنەوە، جێ‌گۆڕکێ، جێ‌گۆڕین، شوێن‌گۆڕکێ، گۆڕینی جێگا یان شوێن 2 هەڵوەدایی، ئاوارەیی، پەرتەوازەیی 3 ئاوی لادراو (لە لایەن کەشتی‌یەوە بۆ پێوانی ئەندازە و قەبارەی کەشتی)، سەنگ یان قەبارەی ئاوی لادراو بەهۆی شتێکی نوقم یان سەرئاوکەوتوو (یان سواراو) لە نێو ئاودا (وەک کەشتی): *a ship with a displacement of 10000 tonnes* 4 (خوازە) لابردن، لادان 5 ڕاگوێستن یا ڕاکێشانی کارەبا 6 جێ‌گۆڕکێ: ڕاگوێستنی (یان وەرسووڕان redirection) هەست و سۆز لە ناوەندی بنەڕەتی‌یەوە بۆ شت، مرۆڤ یان بارودۆخێکی تر 7 قەبارەی ئەو

بۆشایی‌یە کە پیستۆنی لە زەبر (یا رەزبە)یک‌دا بە نێو مۆتۆر، پۆمپ یان شتێکی وادا هات‌وچۆ دەکا (زەوی‌ناسی) ئۆفسێتی offset (تەختە)بەردەکان یان کەڤرەکان کە بەهۆی جوولان بە درێژایی قڵیشێ fault پێکهاتووە ◊ 1 جـایگزینی، جانشینی، تغییر مکان 2 آوارگی 3 مقدار جابجایی آب، پس‌زنی 4 (مجازی) عزل 5 انتقال برق 6 و 7 دیس‌پلاسمنت

**displacement activity** *noun*, displacement behaviour

(زیندە(وە)رناسی و دەروون‌ناسی) چالاکی جێ‌گۆڕکێ یا شوێن‌گۆڕکێ، رەفتاری جێ‌گۆڕکێ: هەڵس‌وکەوت یان رەفتارێکی ئاژەڵ و مرۆڤە کە وادیارە پێوەندی بە بارودۆخەکەوە نەبێ (کەوا تەیدایەتی، وەک دەنووک لێدان بۆ چینە(کردن) یان ئەو جوولە و بزاوتە تایبەتی‌یانە بۆ خۆخاوێن‌کردنەوە لە کاتی شەڕدا) ◊ فعالیت یا رفتار جابجایی

**displacement reaction** *noun*

کاردانەوەی جێ‌گرتنەوە ◊ واکنش جانشینی

**displacement ton** *noun*

یەکەیێ بۆ پێوانی ئاوی لادراوی کەشتی‌یێ، بەرامبەر بە تۆنی گەورە long ton (2,240 پەوند، 1016 کیلۆگرەم) ◊ تن دیس‌پلاسمنت

**display** /dɪ'spleɪ/ *noun*

1 پیشان‌دان، نیشان‌دان، رانان، نواندن، نانەبەر، خستنەروو، خستنەبەرچاو: *a firework display* 2 ئاشکراکردن، دەربڕین، خستنەروو، دەرخستن 3 سەرجەم ئەو شتانەی خراونەتەروو ◊ 1 نمایش 2 ابراز 3 دیسپلی

**display case** *noun*, also display cabinet

شووشەبەندی خستنەروو یان پیشان‌دان (بۆ روانین یان پشکنین، مۆزەخانە، دووکان و...) ◊ کیس نمایش

**displeased** *adjective*

رەنجاو، زیز، زویر، دڵ‌ئێشاو، دڵ‌شکاو، دڵ‌مەند، ناقایل، نارازی، ماسیو، تووڕە، نارەحەت، قەڵس، رق‌هەستاو ◊ دلخور، رنجیده، ناراضی، عصبانی

**displeasing** /dɪ'spli:zɪŋ/ *adjective*

ناخۆش، ناپەسند، جێی پەسند نەبێ ◊ ناخوشایند

**displeasingly** /dɪ'spli:zɪŋli/ *adverb*

ناخۆشانە، بە شێوەیەکی ناخۆش یان ناپەسند ◊ به طور ناخوشایند

**displeasure** /dɪs'pleʒə(r)/ *noun*

رەنجاوی، زیزی، زویری، دڵ‌مەندی، دڵ‌ئێشاوی، عاجزی، دڵ‌شکاوی، دڵ‌مەندی، ناقایلی، ماسیوی، تووڕەیی، رق‌هەستاوی، نارەحەتی؛ (کۆن) offense، injury ◊ رنجش، دلخوری، نارضایی، عصبانیت

**disport** /dɪ'spɔ:t/ *noun*

شادی، خۆشحاڵی، بەکەیفی، خۆشی، رابواردن، سەرقاڵی، سەرگەرمی، pastime ◊ شادمانی، تفریح

**disposable** /dɪ'spəʊzəbl, US -'spoʊ-/ *adjective, noun*

1 *adj* یەکجارە، بۆ یەکجار بەکارهێنراو 2 (ئابووری) پوختە: 3 *disposable income* لەبەردەس خاوەنەکەیەتی *n* شتی یەکجارە ◊ 1 *adj* یکبار مصرف 2 خالص 3 در اختیار صاحبش *n* چیز یکبار مصرف

**disposable income** *noun*

داهاتی پوختە (ئەوەی کە لە پاش باج tax، خەرج‌وبار و هتد دەمێنێتەوە) ◊ درآمد خالص

**disposal** /dɪ'spəʊzl, US -'spoʊ-/ *noun*

1 فڕێدان، تێک‌هاڕین 2 دەزگای هاڕینی زبڵ‌وزاڵ (لە چێشت‌خانەدا) 3 (بۆمب) لەکارخستن 4 هەبوون، لەبەردەستابوون، دەس‌بێ‌راگەیشتن، چاودێری، کۆنترۆڵ 5 رێکخستن، رێک‌وپێک‌کردن، تەکوزاندن، 6 regulation راگوێستن، بەنێوکردن ◊ 1 انهدام 2 دستگاه انهدام زباله 3 خنثی‌سازی 4 اختیار، نظارت 5 تنظیم 6 واگذاری

**disposed** /dɪ'spəʊzd, US dɪ'spoʊzd/ *adjective*

1 مەیل‌دار، پێ‌خۆش، حەزکردوو، تامەزرۆ، ئامادە، ساز، داشکاوە (بۆ): *You're most welcome to join us if you feel so disposed* 2 رێکخراو ◊ *I'm not disposed to argue* ◊ 1 علاقه‌مند، متمایل 2 تنظیم‌شده

**disposition** /ˌdɪspə'zɪʃn/ *noun*

1 رێکخستن، سازدان، سازبوون، ئامادەبوون، هەڵومەرج، رەوش، بارودۆخ، کاودان 2 (کۆن، ب.ت. لە لایەن هێزی خودایی‌یەوە) ویست، خواست 3 ویست 4 داشکانەوە، مەیل، تێندێنی 5 خوو و خدە، خوو، مەزاج، سرشت، تێمپرامێنت 6 جێبەجێ‌بوون، پێکهاتن، جۆربوون 7 (ماف) راگوێستن، بەنێوکردن، پێدان بە شێوەیەکی ماڵ و دارایی بە کەسێکی تر ◊ 1 آرایش، ترتیب، تهیه، آمادگی 2 وضع 3 مشیت 4 گرایش 5 منش، طبع 6 حل و فصل 7 (حقوق) واگذاری

**dispossessed** /ˌdɪspə'zest/ *adjective, noun*

*adj* لەخاوەن‌داری‌خراو، بێ‌بەری‌کراو، بێ‌بەش‌کراو، لەخاوەنێتی‌خراو، لێ‌سەنراو، لێ‌گیراو، لێ‌زەوت‌کراو، دەس‌بەسەرداگیراو (ماڵ، مڵک و هتد) (the dispossessed) *n* لەخاوەنێتی‌خراوان، لێ‌سەنراوان، بێ‌بەری‌کراوان، لێ‌گیراوان، بێ‌خاوەن‌کراوان ◊ *adj* سلب مالکیت‌شده *n* سلب مالکیت‌شدگان

**dispossession** /ˌdɪspə'zeʃn/ *noun*

1 داگیرکردن، زەوت‌کردن، لێ‌سەندن،

دەس بەسەرداگرتن، لێی گرتن 2 دەرکردن، وەدەرنان 3 لەبەردەرچوون ۞ 1 تصرف 2 اخراج 3 رهایی

**disproof** /dɪs'pruːf/ *noun*

1 بەرپەرچ دانەوە، بەدرۆخستنەوە، هەڵوەشاندنەوە، بەتاڵ کردنەوە، ڕەت کردنەوە، پووچ(ەڵ)کردنەوە 2 بەڵگەی هەڵوەشاندنەوە یان ڕەت کردنەوە ۞ 1 رد، تکذیب، ابطال 2 دلیل ابطال

**disproportion** /ˌdɪsprə'pɔːʃn, US -'pɔːrʃn/ *noun*

(فەرمی) نابەرامبەری، ناهاوڕێژەیی، جیاوازی، یەک نەگرتنەوە، پێکەوەنەگونجاوی، disparity ۞ عدم تناسب

**disproportional** /ˌdɪsprə'pɔːʃnl, US -'pɔːrʃnl/ *adjective*

نابەرامبەر، ناهاوڕێژە، جیاواز، پێکەوەنەگونجاو ۞ نامتناسب

**disproportionate** /ˌdɪsprə'pɔːʃənət, US -'pɔːrʃ-/ *adjective*

نابەرامبەر، ناهاوڕێژە، جیاواز، پێکەوەنەگونجاو: *a disproportionate share* ۞ نامتناسب

**disproportionately** /ˌdɪsprə'pɔːʃənətli, US -'pɔːrʃ-/ *adverb*

نامبەرامبەرانە، بە شێوەیەکی ناهاوڕێژە، پێکەوەنەگونجاوانە: *The lower-paid spend a disproportionately large amount of their earnings on food* ۞ به طور نامتناسب

**disproportionateness** *noun*

نابەرامبەری، ناهاوڕێژەیی، جیاوازی، یەک نەگرتنەوە، پێکەوەنەگونجاوی ۞ بی‌تناسبی

**disproportioned** *adjective*

نابەرامبەر، ناهاوڕێژە، جیاواز، پێکەوەنەگونجاو ۞ بی‌تناسب

**disprovable** /dɪ'spruːvəbl/ *adjective*

شیاوی هەڵوەشاندنەوە، هەڵدەوەشێتەوە، لەپووچ کردنەوەهاتوو، شیاوی ڕەت کردنەوە ۞ ابطال‌پذیر، تکذیب‌پذیر

**disputable** /dɪ'spjuːtəbl/ *adjective*

کێشەلەسەر، مشتومڕلەسەر، کێشەبەدوا، روون نییە، ناڕوون، نامەعلووم، جێگای گومان (بڕوانە indisputable) ۞ قابل منازعه، قابل بحث

**disputably** /dɪ'spjuːtəbli/ *adverb*

کێشەلەسەرانە، بە شێوەیەکی کێشەبەدوا ۞ به طور قابل بحث

**disputant** /dɪ'spjuːtənt, US 'dɪspjʊtənt/ *noun*

کەسێ کە مشتومڕ دەکا، مشتومڕباز، مشتومڕکەر، لایەنی مشتومڕ، دیسپیوتانت ۞ منازعه‌کننده، طرف بحث

**disputation** /ˌdɪspju'teɪʃn/ *noun*

کێشە، ململانێ، مشتومڕ، گفت‌وگۆ، قڕە، شەڕەقسە، کێشمەکێش: *continuous -utation between them* ۞ ستیزه، منازعه، جر و بحث

**disputatious** /ˌdɪspjuː'teɪʃes/ *adjective*

1 مشتومڕباز، دمەدمەکردوو، فێرەمشتومڕ، شەڕاشۆ، ئەهلی مشتومڕ 2 = controversial (disputatiousness *n*) ۞ اهل مشاجره

**disputatiously** /ˌdɪspjuː'teɪʃesli/ *adverb*

مشتومڕبازانە، بە شێوەیێکی کێشەلەسەر ۞ به طرز قابل بحث

**dispute** /dɪ'spjuːt, US 'dɪspjuːt/ *noun*

1 دان‌وستان، وت‌ووێژ، گفت‌وگۆ، گوت‌وبێژ 2 مشتومڕ، مشەرعین، شەڕەچەلەحانێ، کێشمەکێش، قسەبەزۆراندان، کێشە، ململانێ، جوڕڕە، شەڕ، جیاوازی (بیرورِا)، تووشی شەڕبوون، قسە لێک‌هەڵبەزینەوە (فریز و زاراوەکان: in dispute: کێشەی لەسەرە، جێی ناکۆکی‌یە، جێی پرسیارە، نەبڕاوەتەوە، بە لایەک دانەخراوە، یەکلایی نەکراوەتەوە، جێی مشتومڕە ◊ beyond dispute: بێ چەند و چۆن، بێ‌گومان، بێ ئەملاوئەولا، مسۆگەر ◊ in dispute with: لە کاتی مشتومڕ یان ناکۆکی‌دا ◊ without dispute: بێ چەند و چۆن، بێ‌گومان، بێ ئەملاوئەولا، مسۆگەر، گفت‌وگۆ یان مشتومڕی ناوێ) ۞ 1 مذاکره، بحث 2 مناقشه، بگومگو، نزاع، ستیزه، دعوا، اختلاف، اصطکاک

**disqualification** /dɪsˌkwɒlɪfɪ'keɪʃn, US -ˌkwɑːl-/ *noun*

1 لێنەوەشاوەیی، لێنەهاتوویی، بەکارنەهاتوویی، نەهێشتنی کەسێ لە کردنی کارێ 2 بێبەش کردن لە ماف، بێبەش کراوی، بێبەری کراوی ۞ 1 عدم صلاحیت، سلب صلاحیت 2 محرومیت

**disqualified** *adjective*

1 لێنەوەشاوە، لێنەهاتوو، بەکارنەهاتوو 2 بێبەش کراو (لە ماف)، بێبەری کراو ۞ 1 فاقد صلاحیت 2 محروم

**disquiet** /dɪs'kwaɪət/ *noun*

نیگەرانی، دڵەڕاوکێ، دڵەتەپێ، دڵەتەپە، ناڕەحەتی ۞ دلهره، نگرانی

**disquieted** *adjective*

نیگەران، ناڕەحەت، پەرێشان، نارام‌لێ‌هەڵگیراو، بێ‌حەجمان ۞ مشوش، نگران

**disquieting** /dɪs'kwaɪətɪŋ/ *adjective*

نیگەران‌کەر، ناڕەحەت‌کەر، ئارام‌لێ‌هەڵگر، بەدڵەتەپەخەر ۞ نگران‌کننده

**disquietingly** /dɪs'kwaɪətɪŋli/ *adverb*

ناڕەحەت‌کەرانە، بە شێوەیەکی نیگەران‌کەر ۞ به طور نگران‌کننده

**disquietness** *noun*, also disquietude /dɪs'kwaɪətjuːd, US -tuːd/

نیگەرانی، دڵەڕاوکێ، دڵەتەپێ، نارەحەتی ⬡ دلهره، نگرانی

**disquisition** /ˌdɪskwɪˈzɪʃn/ *noun*
1 ڕاپۆرتی دوورودرێژ 2 باس کردن یان لێداوان(ی چڕوپڕ) 3 وتار، نامیلکە 4 لێکۆڵینەوە ⬡ 1 گزارش مبسوط 2 شرح 3 مقاله 4 تحقیق

**disregard** /ˌdɪsrɪˈɡɑːd, US -ˈɡɑːrd/ *noun*
1 کەمتەرخەمی، گوێ پێ نەدان، لامسەرلایی، نادەربەستی، بێ خەیاڵی، خۆلێ گێل کردن، گوێ لێ خنین، بەتەنگەوەنەبوون، پشت گوێ خستن، بەهێند نەگرتن، گوێ لێ نەبوون، سەرنج پێ نەدان 2 ڕەچاونەکردن، بێ ڕێزی، بێ حورمەتی ⬡ 1 بی اعتنایی 2 عدم رعایت، بی احترامی

**disregardful** *adjective*
کەمتەرخەم، گوێ پێ نەدەر، بێ خەیاڵ، گوێ لێ نەبوو، بەتەنگەوەنەبوو، پشت گوێ خەر ⬡ بی توجه، بی اعتنا

**disrelish** /dɪsˈrlɪʃ/ *noun*
(کۆن) ناخۆش ویستن، ڕق لێ بوون، قین لێ بوون، چاو پێ هەڵنەهاتن ⬡ تنفر

**disrepair** /ˌdɪsrɪˈpeə(r), US -ˈper/ *noun*, in disrepair
خراپ، دەبێ چاکرێتەوە، پێویست بە دەس پیاگێڕان ⬡ خراب

**disreputability** /dɪsˌrepjətəˈbɪləti/ *noun*
ناوزڕاوی، خراپی، بەدناوی، بێ ئابڕوویی، بێ بڕەوی، بێ بایەخی ⬡ بدنامی، بی اعتباری

**disreputable** /dɪsˈrepjətəbl/ *adjective*
1 ئابڕووبەرە، خراپ، ناحەز، دزێو، شوورەیی، شەرماوی، عەیب، بێ ئابڕوو، ڕووڕەش، ناوزڕاو، بەدناو: *a disreputable area of the city* 2 (شر و)شپرزە، ناشیرین، شێواو ⬡ 1 ننگین، زشت، رسوا، بدنام 2 نامرتب

**disreputably** /dɪsˈrepjətəbli/ *adverb*
ئابڕووبەرانە، بە شێوەیەکی خراپ یان ناحەز ⬡ به طور زشت

**disrepute** /ˌdɪsrɪˈpjuːt/ *noun*
بێ ئابڕوویی، ڕووسیایی، بەدناوی، ڕووڕەشی، ناوزڕاوی، بێ بایەخی، بێ باوەڕی ⬡ بدنامی، رسوایی، بی اعتباری

**disrespect** /ˌdɪsrɪˈspekt/ *noun*
بێ ڕێزی، بێ حورمەتی، سووکایەتی: *-espect for the law* ⬡ بی احترامی

**disrespectful** /ˌdɪsrɪˈspektfl/ *adjective*
بێ ڕەوشت، ڕووشە، بێ شەرم، ناماقووڵ، ناماقووڵانە، سووکانە ⬡ بی ادب، بی ادبانه

**disrespectfully** /ˌdɪsrɪˈspektfəli/ *adverb*
ناماقووڵانە، سووکانە، بێ ڕەوشتانە، سووک، خراپ ⬡ بی ادبانه

**disrupt** /dɪsˈrʌpt/ *adjective*, also disrupted
جیاوەبوو، لێکەوەبوو ⬡ جداشده

**disruption** /dɪsˈrʌpʃn/ *noun*
1 شەقوپەق بوون، ونجڕونجڕ بوون، لەتوکوت بوون، لێک هەڵوەشان، پارچەپارچەبوون، وردوخاش بوون، شێواوی، شێوان، تێکچوویی، پەک خران، نارێکوپێکی، شپرزەیی، ئاژاوە، پشێوی، ئاڵۆزی، گێرەشێوێنی، شێواندن، تێک دان: *disruptions to rail services* 2 کەلەبەر، کەلێن، قەڵەشت، جیایی، جیابوونەوە 3 بڕین ⬡ 1 تجزیه، فروپاشی، بی نظمی، آشوب، برهم زنی 2 شکاف، جدایی 3 قطع

**disruptive** /dɪsˈrʌptɪv/ *adjective*
1 تێکدەر، گێرەشێوێن، خومەشێوێنکە، شێوێنەر: ◊ *agitators trying to disrupt the meeting* *She had a disruptive influence on the rest of the class* 2 مایەی شکان یان قەڵەشان ⬡ 1 مخل 2 موجب شکستگی

**disruptively** /dɪsˈrʌptɪvli/ *adverb*
شێوێنەرانە، تێکدەرانە، گێرەشێوێنانە ⬡ به طور مخل

**dissatisfaction** /ˌdɪsˌsætɪsˈfækʃn/ *noun*
ناقایلی، نارازی بوون، نارەزایی، پێ ناخۆش بوون، بێزاری، دڵمەندی ⬡ نارضایی، ناخشنودی

**dissatisfied** /dɪsˈsætɪsfaɪd, US dɪˈsæt-/ *adjective*
ناقایل، نارازی، بێزار، پێ ناخۆش بوو، دڵمەند ⬡ ناراضی، ناخشنود

**dissatisfiedly** *adverb*
ناقایلانە، نارازی یانە، بێزارانە، دڵمەندانە ⬡ به طور ناراضی، ناخشنودانه

**dissaver** *noun*
هەڵەخەرج، زیادەخەرج، عەبلەخەرج ⬡ مسرف

**dissaving** *noun*
1 هەڵەخەرجی، زیادەخەرجی، عەبلەخەرجی 2 (dissavings) بڕی خەرج کراوی زیادی ⬡ 1 اسراف 2 ساوینگ

**dissection** /dɪˈsekʃn, US daɪ-/ *noun*
1 یەکالاکردنەوە، توێکاری، توێ توێ کردن 2 تاوتوێ، لێکدانەوە، لێکۆڵینەوە، شی کردنەوە (زۆر بە وردی) ⬡ 1 تشریح، کالبدشکافی 2 بررسی

**dissector** *noun*
1 یەکالاکەرەوە، توێکار، ئامێری توێکاری، نەشتەر 2 وتاری توێکاری ⬡ 1 کالبدشکاف، تشریح گر، ابزار تشریح 2 مقالەی تشریح

**dissected** *adjective*
1 (ڕووەکناسی، گەڵا) دابڕدابڕ 2 (زەوی ناسی، بان یان بەرزایی) دۆڵ دۆڵ، شیوشیو (قووڵ) ⬡ دیس سکتید

**dissemblance** /dɪˈsembləns/ *noun*
ڕیایی، ڕیایی بازی، دووڕوویی، مەڕایی، ڕووپامایی، واخۆنیشاندان ⬡ تزویر، ریاکاری

**dissembler** /dɪ'semblə(r)/ *noun*
دووڕوو، ڕیایی‌باز، ڕووپاما، ڕووبین ۞ ریاکار، مزور

**dissemination** /dɪˌsemɪ'neɪʃn/ *noun*
بلاوکردنەوە، بلاوبوونەوە، دەنگ‌دانەوە، وەشان، تەنینەوە، داگرتن، پەل‌هاویشتن ۞ اشاعه، پخش، انتشار

**disseminator** *noun*
بلاوکەرەوە، بلاوکە ۞ انتشاردهنده

**dissension** /dɪ'senʃn/ *noun*
مشتومڕ، شەڕەقسە، قڕە، جوڕڕە، کێشە، ناخۆشی، ململانێ، شەڕ، کێشەمەکێش، دووبەرەکایەتی، ناتەبایی، کێشە، ناکۆکی: ۞ *dissension within the government* مناقشه، نزاع، دعوا، اختلاف، شقاق

**dissensus** /dɪ'sɛnsəs/ *noun*
دژایەتی بەربلاو، بەرهەڵستی بەرفرەهـ ۞ مخالفت گسترده

**dissent** /dɪ'sent/ *noun*
دژایەتی، بەرهەڵستی: *political/religious dissent* ۞ مخالفت

**dissenter** /dɪ'sentə(r)/ *noun*
1 دژ، دژبەر، پۆزبەر، رکەبەر، بەرهەڵستی‌گەر، جودابیر، نەتڵ 2 (Dissenter میژوویی، بریتانیا) = Nonconformist ۞ مخالف

**dissentient** /dɪ'sɛnʃɪənt, US -ʃ(ə)nt/ *adjective, noun*
*adj* دژی زۆرینە، دژبەری زۆربە، زۆرینەدژ، بەرهەڵستی‌گەری زۆرینە *n* مرۆی دژی زۆرینە (:dissentience or dissentiency *n*) (dissentiently *adv* ۞ *adj* مخالف اکثریت *n* آدم مخالف اکثریت

**dissenting** /dɪ'sentɪŋ/ *adjective*
دژ، دژبەر، پۆزبەر، رکەبەر، بەرهەڵستی‌گەر، ناهـــاوبیر: *dissenting groups/voices/views/opinion* ۞ مخالف

**dissention** = dissension

**dissepiment** /dɪ'sɛpɪm(ə)nt/ *noun*
(گیانەوەرناسی و رووەکناسی) دیوارە، دیوار، کوڵەکە، پەردە، پەرە، جیاکەرەوە، septum ۞ (dissepimental *adj*) جدار، پره

**dissertation** /ˌdɪsə'teɪʃn, US -sər't-/ *noun*
1 بڕوانامە، تێز، دوکتورانامە 2 وتار، نقیسار ۞ 1 رساله، پایان‌نامه 2 مقاله

**dissertational** *adjective*
سەربە dissertation ۞ وابسته به dissertation

**disservice** /dɪs'sɜːvɪs, dɪ'sɜː-, US -'sɜːrv-/ *noun*
زەربە، زەرەر، خەسار، زیان، خراپی، ئازار، ئێش ۞ لطمه، ضرر، بدی

**disserviceable** /dɪs'sɜːvɪsəbl/ *adjective*
بەزەرەر، بەئازار، بەزیان، بەزەر، بەوەی، خراپ ۞ زیان‌بخش، مضر

**disseverance** /dɪs'sɜːvənəs/ *noun*
جیایی، جودایی، جیابوونەوە، دابڕین ۞ جدایی، جداسازی

**dissidence** /'dɪsɪdəns/ *noun*
دژایەتی، کێشە، بەرهەڵستی، دووبەرەکی ۞ اختلاف، تفرقه

**dissident** /'dɪsɪdənt/ *adjective, noun*
دژ، دژبەر، پۆزبەر، رکەبەر، بەرهەڵست(ی گەر)، ناهاوبیر، جودابیر (لەگەڵ سیاسەتی فەرمی) ۞ مخالف، دگراندیش

**dissimilar** /dɪ'sɪmɪlə(r)/ *adjective*
جیاواز، جیا، لێک‌نەچوو، ناچوونیەک، لەیەکترنەچوو، ناهاوشێوە، ناهاوجۆر، نەیەک، unlike ۞ مختلف، ناهمگن، ناهمانند

**dissimilarity** /ˌdɪsɪmɪ'lærəti/ *noun,* also dissimilitude /ˌdɪssɪ'mɪlətuːd, US -tjuːd/
جیاوازی، فەرق، لێک‌نەچوویی، ناچوونیەکی، لەیەکترنەچوویی، شێوەی یەک‌ترنەداوی، ناهاوشێوەیی، ناهاوجۆری، نەیەکی ۞ اختلاف، ناهمانندی، عدم شباهت

**dissimilarly** /dɪ'sɪmɪləli/ *adverb*
بە شێوەیێکی جیاواز یان جیا، لێک‌نەچووانە، ناچوونیەکانە، ناهاوشێوانە ۞ بە طور مختلف، ناهمگنانه، به طور ناهمانند

**dissimilation** *noun*
(زمانەوانی) لێک‌نەچوویی، ناچوونیەکی ۞ (dissimilatory /dɪ'sɪmɪlət(ə)ri/ *adj*) ناهم‌گونی

**dissimulation** /dɪˌsɪmju'leɪʃn/ *noun*
1 شاردنەوە، دەرنەخستن، تەقیە (بیر و بۆچوون، هەست‌ونەست و هتد) 2 دووڕوویی، ریایی‌بازی، فریودان، هەڵفریواندن، فێڵ، تەڵەکە، درۆ ۞ 1 تقیه 2 تزویر، ریا، خدعه

**dissimulator** *noun*
ریایی‌باز، دووڕوو ۞ ریاکار

**dissipated** /'dɪsɪpeɪtɪd/ *adjective*
رابویر، خۆش‌گوزەران، رادەر (بە شێوەیێ کە خراپ بێ)، :dissolute *He plays a dissipated American writer living in Europe* ۞ عیاش، خوش‌گذران

**dissipation** /ˌdɪsɪ'peɪʃn/ *noun*
1 لاچوون، نەمان، رەوانەوە 2 بەفیڕۆدان، خەسارکردن، بەبایادان، لەخەسارگێڕان، بەهەدەردان، زایەکردن: *the dissipation of energy in the form of heat* 3 دەسبلاوی، خۆش‌گوزەرانی، رابواردن، رادان 4 بلاوبوونەوە، پەرت‌بوون، پەرشی، پەرش‌کردن، بلاوکردنەوە، دردان ۞ 1 رفع 2 اتلاف 3 اسراف، عیاشی 4 پراکندگی، پراکنده‌سازی

**dissipative** /ˈdɪsɪpeɪtɪv/ *adjective*
دەسبلاوانە ۞ اسراف‌آمیز
**dissociable** /dɪˈsəUSəbl/ *adjective*
لەجیابوونـــەوەهاتوو، لـــەلێبوونـــەوەهاتوو، جیادەبێتەوە، لێک دەبێتەوە separable ۞ قابل تفکیک، جدایی‌پذیر
**dissocial** /dɪˈsəUSəl/ *adjective*
دوورەپەرێز، unsocial ،selfish ۞ غیرمعاشر
**dissociation** /dɪˌsəʊʃiˈeɪʃn, -ˌsəʊs-, US -ˌsoʊ-/ *noun*
جیاکردنـەوە، لێـک‌داپڕانـدن، لێـک‌هەڵـبڕاندن، لێـک‌کـشاندنەوە، لێـک‌کردنـەوە، لێـک‌تـرازان، لێک‌هەڵوەشاندن ۞ تفکیک، تلاشی
**dissociative** /dɪˈsəʊʃieɪtɪv, ˈˌsəUS-, US -ˈsoʊ-/ *adjective*
جیاکەرەوە، لێک‌داپڕ ۞ تفکیک‌کننده
**dissolubility** /dɪˌsɒljʊˈbɪlətɪ/ *noun*
لەتوانەوەهاتوویی ۞ قابلیت حل
**dissoluble** /dɪˈsɒljʊbl/ *adjective*
1 لەتوانـەوەهاتوو، دەتوێتـەوە، شـل‌دەبێتـەوە 2 (خـوازە) هەڵدەوەشـێتەوە ۞ 1 قابـل حـل 2 (مجازی) فسخ‌شدنی
**dissolute** /ˈdɪsəluːt/ *adjective*
1 ناتاکـاری، هەرزانـە، بەدڕەوشـت، بـەدناکار، داوێن‌پیس، خراپ، پیس، زۆڵ، بێ‌سـەرەوبەرە، هـەرزە، بـەدکار: *as drink or promiscuous sex* 2 رابـوێر، رادەر، خـۆش‌گـوزەران ۞ 1 غیراخلاقی، فاسد 2 عیاش
**dissolutely** /ˈdɪsəluːtli/ *adverb*
رابوێرانە، لە رووی هەرزەیی‌یەوە، هەرزانە ۞ از روی عیاشی
**dissoluteness** /ˈdɪsəluːtnəs/ *noun*
1 بەدڕەوشتی، بەدناکاری، داوێن‌پیسی، زۆڵـی، خراپـی، پیـسی، بـێ‌سـەرەوبەرەیی، هـەرزەیی، بەدکاری 2 رابواردن، رادان، خۆش‌گوزەرانی ۞ 1 فسق، فساد 2 عیاشی
**dissolution** /ˌdɪsəˈluːʃn/ *noun*
1 توانـەوە، خێـوران، شـلەوەبوون، پـشافتن 2 لێـک‌بوونـەوە، لێـک‌تـرازان، داڕزان، داوەشـان، هەڵوەشان، هـەرەس‌هێنـان، کۆتـایی(پـێ)هـاتن، تیاچوون، لاچوون، نەمان، مـەرگ 3 تـەواوبوون، دوایی‌پێ‌هـاتن ۞ 1 حـل، گـداختگی 2 تجزیـە، فسخ، فروپاشی، زوال 3 اختتام
**dissolved** *adjective*
1 تـواوە، شـلە 2 (لێـک)هەڵوەشاو، لێک‌ترازاو، داوشاو، لەبەریەک‌چوو ۞ 1 محلول 2 فسخ‌شده، منحل
**dissolvent** /dɪˈzɒlvənt/ *noun, adjective*
(مەتریال) توێنەر، شل‌کەرەوە ۞ (مادە) محلل
**dissonance** /ˈdɪsənəns/ *noun*
1 ناسـازی، (پێکـەوە)نـەگونجاوی، نەسـازاوی، دژایـەتی، کێشە، نـاکۆکی، ناتـەبایی 2 (موسـیقا) یـەک‌نەگرتنـەوە، لێـک‌دووری ۞ 1 ناسـازگاری، اختلاف 2 (موسیقا) ناهم‌خوانی
**dissonant** /ˈdɪsənənt/ *adjective*
ناسـاز، (پێکـەوە)نـەگونجاو، نەسـازاو، یەک‌نەگرەوە، رێک‌نەکەوتوو، یەک‌نەکەوتوو، ناکۆک، ناتەبا: *dissonant voices* ۞ ناسـازگار، ناهماهنگ
**dissonantly** /ˈdɪsənəntli/ *adverb*
بـە شـێوەیەکی ناسـاز، ناکۆکانـە، بـە شـێوەیەکی ناتەبا ۞ به طور ناسازگار
**dissuasion** /dɪˈsweɪʒn/ *noun*
پەشـیمان‌کردنـەوە، سـاردکردنەوە، گێڕانـەوە، نەهێـشتن، هێنانەسـەرڕێ، قایـل‌کـردن ۞ منصرف‌سازی، متقاعدسازی
**dissuasive** /dɪˈsweɪsɪv/ *adjective*
پەشیمان‌کـەرەوە: *a dissuasive effect* ۞ منصرف‌کننده
**dissyllabic** /ˌdɪsɪˈlæbɪk/ *adjective*
دووبڕگەیی، دووکەرتەیی ۞ دوهجایی
**dissyllable** /dɪˈsɪləb(ə)l/ *noun*
وشـەی دووبڕگـەیی یـان دووکەرتـەیی ۞ واژەی دوهجایی
**dissymmetric** *adjective, also* dissymmetrical /ˌdɪssɪˈmetrɪkl/
بێ‌هاوتا، ناهاوتا، نەبوونی symmetry ۞ بی‌قرینه
**dissymmetry** /ˌdɪsˈsɪmətrɪ/ *noun, pl.* dissymmetries
بێ‌هاوتایی، ناهاوتایی ۞ بی‌قرینگی
**distaff** /ˈdɪstɑːf, US ˈdɪstæf/ *noun*
1 دووخ (ئامێرێ کە گلۆلەبەنی نەرێسراو یـان خـاوی (بـە هـەلاشـمی) پیاهەڵـکراوە و دوای رستن دەکرێ بە تەشی‌یەوە) 2 کـاری ژنانـە 3 (دەسەلاتی) ژن ۞ 1 فرموک 2 کار زنانه 3 زن
**distal** /ˈdɪstl/ *adjective*
(زۆرتر توێکاری) دوور لە ناوەند یـان سـەرەتا، *the distal end of the tibia* :proximal دژی ۞ دور از مرکز یا مبدأ
**distance** /ˈdɪstəns/ *noun*
1 رێگـــا، مـــەودا، دووری، دۆژ، دوورەوە، جیـاوازی، مـاوە: *the distance of the earth from the sun* 2 ساردی، ساردوسڕی، نەدوێنی، کەم‌قسـەیی، نەمرچی 3 کـاکی‌یـەکاکی، چۆڵـگە، چۆڵەوار، دەشت (فرێز و زاراوەکان: **at/from a distance**: نـە زۆر نزیـک، لـە دوورەوە، لـە مـەودایێکـی کـەم ◊ **at a distance of**: بـە مەودایێکی ◊ **in the distance**: گـەلێ دوور، لە مەودایێکی دوور ◊ **no distance**: نزیـک، دوور نییە ◊ **from a distance**: لە دوورەوە ◊ **go the (full) distance**: (پـێش‌بـرکێ و وەرزش) تـا کۆتـایی‌یـەکەی بـەردەوام بـوون) ۞ 1 مـسافت،

فاصله، بعد، تفاوت، مدت 2 سردی 3 بیابان برهوت

**distance learning** *noun*

فێربوون یان خوێندنی مەودایی (شێوەیەکی خوێندن لە ماڵەوە، کە لەودا مەشقەکانت بۆ مامۆستاکەت دەنێری) ۞ یادگیری مسافتی

**distance race** *noun*

(پێشبڕکێ) راکردن یان هەڵاتنی توند ۞ دوی سرعت

**distance relay** *noun*

راکردنی بە نۆرە یان یاریدەیی ۞ دوی امدادی

**distant** /'dɪstənt/ *adjective*

1 دوور، لە دوورەوە، ڕێگازۆر، دوورودرێژ، دوور، جیاواز، far-off: *a distant galaxy* 2 کەم، هیچ، نیوەچڵ 3 سارد، ساردوسڕ، ناگەرموگوڕ، نەدوێن، نەمرچ ۞ 1 دور، از دور، طولانی، متفاوت 2 جزئی، خفیف 3 سرد

**distantly** /'dɪstəntli/ *adverb*

کەمێ، نەختێ، بڕێ، لە دوورەوە، لە دوور، ساردانە، نەمرچانە: *Somewhere, distantly,* ◊ *he could hear the sound of the sea* ۞ اندکی، از دور، با سردی *We're -tly related*

**distaste** /dɪs'teɪst/ *noun*

1 بێمەیلی، نابەدڵی، بێخۆشنەبوون، نیشتیالێنەبوون 2 رقلێبوون، قینلێبوون، بێزاری، ناخۆشویستن، لێبێزران ۞ 1 اکراه، بی‌میلی 2 تنفر

**distasteful** /dɪs'teɪstfl/ *adjective*

ناخۆش، بێتام، ناپەسند، نابەدڵ، ناحەز، ناشیرین، ناشایست، بێشەرمانە، لێنەوەشاو، دزێو، بێزاوی، جێیقینلێبوون یان بێزاری، قێزەون، disagreeable ،unpleasant: *found a shady, distasteful* ◊ *the job distasteful character* ۞ نامطبوع، ناخوشایند، نفرت‌انگیز

**distastefully** /dɪs'teɪstfəli/ *adverb*

بە شێوەیەکی بێزاوی، قێزەونانە ۞ بە طور نفرت‌انگیز

**distastefulness** /dɪs'teɪstfəlnəs/ *noun*

رقلێبوون، قینلێبوون، بێزاری، ناخۆشویستن، لێبێزران ۞ نفرت، تنفر

**distemper**[1] /dɪ'stempə(r)/ *noun*

1 (جاران) رەنگی لۆعاب یان دیوار (جۆرێ رەنگ کە لەگەڵ ئاو تێکەڵ دەکرا) 2 شێوازی بەکارهێنانی ئەو رەنگە ۞ 1 رنگ‌لعابی 2دیستمپر

**distemper**[2] /dɪ'stempə(r)/ *noun*

1 (نەخۆشی سەگ) سەگنیسیە، سەگەناز، بەهۆی paramyxovirus تووش دەبێ [جۆر *Morbillivirus*] لە توخمی *Canine distemper virus* 2 (کۆن، خوازە) ئاژاوە، ئاڵۆزی، پشێوی، پاشاگەردانی (سیاسی) ۞ 1 نزله‌ی سگ 2 (مجازی) اغتشاش، آشوب

**distemperate** *adjective*

زێدەڕەو، تونڕەو ۞ افراطی

**distended** *adjective*

ماسیو، باکردوو، پەنەمیاو، ئەستووربوو ۞ متورم

**distensibility** /dɪsˌtensəbɪləti/ *noun*

لەماسینهاتوویی، لەهەڵماسینهاتوویی، لەکشانهاتوویی ۞ تورم‌پذیری، انبساط‌پذیری

**distensible** /dɪs'tensəbl/ *adjective*

لەهەڵماسینهاتوو، لەماسینهاتوو، هەڵدەماسێ، دەماسێ، گەورە دەبێتەوە، بادەکا، دەپەنمێ، ئەستوور دەبێ، لەکشانهاتوو، دەکشێ ۞ تورم‌پذیر، انبساط‌پذیر

**distension** /dɪ'stenʃn/ *noun*

(هەڵ)ماسین، ئاوسان، باکردن، هەڵمسان، پەنەمیان، ئەستووربوون، ئەستووربوون، کشان، هەراوبوون ۞ بادکردگی، ورم، انبساط

**distich** /'dɪstɪk/ *noun*

(هەڵبەست) دێڕ،ماڵک، خشتان، دووخشت (بنەڕەت: لە یۆنانی: *di* "دوو" + *stikhos* "خشت، دێڕ") ۞ بیت

**distillation** /ˌdɪstɪ'leɪʃn/ *noun*

1 دڵۆپاندن، چۆڕاندنەوە، تکاندن 2 ئارەقدروسکردن، ئارەقگرتن، ئارەقنانەوە 3 ئارەق، ئاوگ، شیلە، چۆڕاوە 4 کورتکردنەوە، کەمکردنەوە ۞ 1 تقطیر 2 مشروب‌سازی 3 عرق، عصاره 4 تلخیص

**distilled** *adjective*

1 دڵۆپێنراو، چۆڕێنراو، تکێنراو 2 کورتە، پوختە، هەڵبژاردە ۞ 1 مقطر 2 برگزیده، خلاصه

**distilled water** *noun*

ئاوی دڵۆپێنراو، ئاوی چۆڕاوە، چۆڕاوە، چۆڕاوک، ئاوی کێشراو ۞ آب مقطر

**distiller** /dɪ'stɪlə(r)/ *noun*

1 ئارەقدروسکەر، ئارەقنەرەوە، ئارەقگرەوە 2 دەزگای دڵۆپاندن، دڵۆپێنە ۞ 1 مشروب‌ساز 2 دستگاه تقطیر

**distillery** /dɪ'stɪləri/ *noun, pl.* distilleries

کارگە یان کارخانەی ئارەقدروسکردن (وەکوو ویسکی و هتد) ۞ کارخانه‌ی مشروب‌سازی

**distinct** /dɪ'stɪŋkt/ *adjective*

1 روون، دیار، ئاشکرا، راشکاو، خویا، دیار، بەرچاو 2 جیا، لێکجیا، جیاواز، جودا 3 بێئەملاوئەولا، مسۆگەر، بێچەندوچۆن، بێشک، گومانلێنەکراو ۞ 1 روشن، واضح، مشخص 2 متمایز، مجزا 3 حتمی، قطعی

**distinction** /dɪ'stɪŋkʃn/ *noun*

1 جیاوازی، لایەنی جیاکردنەوە، لێکهەڵاواردن، جیاکاری، فەرق، جهێرەنگی 2 دیاریکردن، لێککردنەوە، جیاکردنەوە 3 ئیمتیاز، باشی، چاکی، لایەنی دیار، لەسەرتربوون، بەسەرداشکانەوە 4 ناو، سەرنێو، شانازی، سەربەرزی 5 پلە، نمرە، پایە، شان، ریزە 6

ئاشکرایی، روونی، دیاربوون، رۆهنی ◇ 1 تمایز، تفاوت، تفاوت‌گذاری 2 تشخیص، تمیز 3 امتیاز، برتری 4 لقب، افتخار 5 رتبه، درجه 6 وضوح

**distinctionless** *adjective*
بێ‌جیاوازی ◇ بدون تمایز

**distinctive** /dɪˈstɪŋktɪv/ *adjective*
1 جیاواز، فەرق‌هەبوو، جودا، جیا، دیار، جیاکەرەوە، دیاری‌کەر، جیاکار: *clothes with a distinctive style* 2 تایبەتی، پێشان‌دەر، دەرخەر (distinctiveness *n*: جیاوازی، جیایی، فەرق، جوداهی) ◇ 1 متفاوت، متمایز، مجزا، مشخص 2 اختصاصی، نمایان‌گر

**distinctively** /dɪˈstɪŋktɪvli/ *adverb*
بە شێوەیەکی جیاواز یان دیار ◇ بە طور متمایز یا مشخص

**distinctly** /dɪˈstɪŋktli/ *adverb*
بە ئاشکرایی، بە راشکاوی، بە شێوەیەکی دیار یان لەبەرچاو: *a distinctly Australian accent* ◇ بە طور واضح، بە طور مشخص

**distinctness** /dɪˈstɪŋktəs/ *noun*
دیاری، ئاشکرایی، روونی، رۆهنی ◇ وضوح

**distingué** /dɪˈstaŋgeɪ/ *fem.* distinguée pronunc. same = distinguished

**distinguishable** /dɪˈstɪŋgwɪʃəbl/ *adjective*
1 شیاوی لێک‌کردنەوە، شیاوی ناسینەوە، دیاری دەکرێ، دەناسرێتەوە 2 جیاواز، جیا ◇ 1 قابل تمیز 2 متفاوت

**distinguished** /dɪˈstɪŋgwɪʃt/ *adjective*
1 مەند، قورس، جێی‌رێز، پەسند، دیار، نێوبەدەرەوە، ناسراو، بەنێوبانگ 2 هەڵکەوتوو، دەرکەوتوو، دیار، بەرجەستە، هەرەباش: *distinguished leadership* ◇ 1 موقر، مشخص، مشهور 2 ممتاز

**distinguishing** *adjective*
جیاکەرەوە، دیاری‌کەر، لێک‌کەرەوە ◇ ممیز، متمایزکننده

**distorted** *adjective*
1 ناحەز، ناشیرین، تێکچوو، گۆڕاو، لەشێوەکەوتوو، ناقۆڵا، نالەبار، ناهەموار، گرژ، گرژهەڵاتوو، داچۆڕاو، باهەڵدراو، لوول، پێچ‌دراو 2 خوارووخێچ، لارووێر، کووڕ، گەڕاو، چەپ‌وگێڕ 3 شێوێنراو، چەواشەکراو، دەسکاری‌کراو، گۆڕاو ◇ 1 بدریخت 2 کج‌وکوله 3 تحریف‌شده

**distortedly** *adverb*
بە شێوەیێکی چەواشەکراو یا دەسکاری‌کراو ◇ بە طور تحریف‌شده

**distortedness** *noun*
1 ناحەزی، ناشیرینی، ناقۆڵایی، نالەباری 2 شێوێنراوی، چەواشەکراوی، دەسکاری‌کراوی، گۆڕاوی ◇ 1 بدریختی 2 تحریف‌شدگی

**distortion** /dɪˈstɔːʃn, US dɪˈstɔːrʃn/ *noun*
1 گۆڕانی شێوە، تێکچوون، لاری، خواری، باهەڵدراوی، بادراوی، پێچ‌دراوی، لوول‌دراوی 2 لارکردن، گەڕاندن، خوارکردن 3 دەسکاری‌کردن، شێواندن، گۆڕین، چەواشەکردن: *a distortion of the facts* ◇ 1 تغییر شکل، کجی، پیچیدگی 2 کج‌سازی 3 تحریف

**distortional** *adjective*
سەربە distortion ◇ وابسته بە distortion

**distracted** /dɪˈstræktɪd/ *adjective*
هۆش‌لانەبوو، شێواو، پەرێشان، سەربەکاری خۆنەبردوو، سەرلێ‌شێواو، قاڵ، گێژ، کاس، نگەران، نارەحەت، بێ‌حەجمان، ئارام‌لێ‌هەڵگیراو، بێ‌ئۆقرە ◇ حواس‌پرت، بی‌تاب

**distractedly** /dɪˈstræktɪdli/ *adverb*
گێژانە، نارەحەتانە، بە شێوەیێکی ئارام‌لێ‌هەڵگیراو: *I walked up and down distractedly, waiting for news* ◇ با حواس‌پرتی، با بی‌تابی

**distracting** *adjective*
ملۆزم، سەرلێ‌شێوێن، مایەی نارەحەتی ◇ مزاحم

**distraction** /dɪˈstrækʃn/ *noun*
1 هۆش‌بڵاوی، سەرلێ‌سەنراوی، گێژی، تاساوی، حەپەساوی، کاسی، سەرلێ‌شێواوی، شێواوی، پەرێشانی 2 سەرقاڵی، شتی خەلافاندن 3 (خوازە) شێتی، سەوداسەری، شەیدایی ◇ 1 حواس‌پرتی، آشفتگی 2 سرگرمی 3 (مجازی) دیوانگی

**distractive** /dɪˈstræktɪv/ *adjective*
گێژکەر، مایەی هۆش‌بڵاوی ◇ گیج‌کننده

**distrainee** *noun*
قەرزاری ماڵ‌گیراو یا ماڵ‌گلەوەدراو ◇ دیسترینی

**distraint** /dɪˈstreɪnt/ *noun*, also distrainment
گرتن، راگرتن، گل‌دانەوە ◇ توقیف

**distrait** /dɪˈstreɪ, US ˈdɪstreɪ/ *adjective*, *fem* distraite /-ˈstreɪt/
هۆش‌بڵاو، سەرلێ‌سەنراو، سەرلێ‌شێواو، گێژ، کاس، شڵەژاو، تاساو، شێواو، پەرێشان ◇ حواس‌پرت

**distraught** /dɪˈstrɔːt/ *adjective*
1 هۆش‌بڵاو، نارەحەت، سەرلێ‌سەنراو، سەرلێ‌شێواو، گێژ، کاس، شێواو، پەرێشان 2 (خوازە) شێت، شێت‌وشەیدا، سەوداسەر ◇ 1 حواس‌پرت، آشفته 2 (مجازی) دیوانه

**distress** /dɪˈstres/ *noun*
1 خەم، خەفەت، پەژارە، کەسەر، دڵتەنگی، ماتی، کزی، پەرێشانی، دەردی دەروون، نارەحەتی، سەغڵەتی، نیگەرانی 2 ئازار، دەرد، مەینەتی، ئێش، ژان، رەنج، زەحمەت، ئەرک، مایەی خەم و خەفەت، مایەی مەینەتی 3 هەژاری، دەستەنگی، فەقیری، نەداری 4 گێچەڵ، گیرەوکێشە 5 ماندوویی، لەپێ‌کەوتوویی، شەکەتی، داماوی، ناچاری 6 مەترسی، دۆخی

تەنگەتاوی، تەنگانە، تەنگافی 7 (ماف) گرتن، گلدانەوە، ماڵی گیراو یان گلەوەدراو ◌ 1 اندوه، غم، افسردگی 2 عذاب، رنج، مایەی عذاب 3 فقر، مضیقه 4 مخمصه 5 خستگی، فرسودگی 6 خطر 7 (حقوق) توقیف، اموال توقیف‌شده

**distressed** /dɪ'strest/ *adjective*
1 خەمبار، پەژارەبار، دڵتەنگ، مات، کز، پەریشان، دڵبڕ، نارەحەت، سەغڵەت، نیگەران، دڵبەدوا، جەرگبڕاو، جەرگسووتاو 2 ماندوو، شەکەت، لەپێکەوتوو 3 هەژار، دەستەنگ، نەدار، بەلەنگاز، فەقیر ◌ 1 اندوهگین، افسرده، مضطرب 2 خسته، فرسوده 3 فقیر

**distressful** /dɪ'stresfl/ *adjective*
جێی خەم، خەماوی، خەمبار، بەئێش، بەژان، جەرگبڕ، ناخۆش، تاڵ (distressfulness *n*) ◌ غم‌انگیز، دردناک، ناگوار

**distressfully** /dɪ'stresfəli/ *adverb*
بە شێوەیەکی بەژان، بەسوێیانە، جەرگبڕانە ◌ بە طور دردناک

**distressing** /dɪ'stresɪŋ/ *adjective*
جێی خەم، خەماوی، خەمبار، بەئێش، بەژان، جەرگبڕ، ناخۆش، تاڵ: *It was a very -ssing documentary* ◌ غم‌انگیز، دردناک، ناگوار

**distressingly** /dɪ'stresɪŋli/ *adverb*
بە شێوەیەکی بەژان، بەسوێیانە، جەرگبڕانە ◌ بە طور دردناک

**distress sale** *noun*
هەراجی ماڵی گیراو (یان گلەوەدراو) ◌ حراج اموال توقیف‌شده

**distress warrant** *noun*
دەستووری گلدانەوە (ماڵ) ◌ حکم توقیف

**distributary** /dɪ'strɪbjʊt(ə)ri/ *noun, pl.* distributaries
زێ، لقی رووبار یان چۆم ◌ شعبەی رود

**distributed system** *noun*
ژمارەیێ لەو کامپیوتێرە سەربەخۆیانەی کە بە تۆڕێکەوە پێکەوە بەستراون ◌ دیستریبیوتید سیستم

**distribution** /ˌdɪstrɪ'bju:ʃn/ *noun*
دابەش‌کردن، بەشینەوە، دابەشین، پەخش، داڵبەخش(کردن)، پارفەکردن، بڵاوکردنەوە، بەش‌بەش‌کردن ◌ تقسیم، توزیع، پخش

**distributional** /ˌdɪstrɪ'bju:ʃənl/ *adjective*
بڵاوکردنەوەیی، بەخشی ◌ توزیعی

**distributive** /dɪ'strɪbjətɪv/ *adjective*
بڵاوکردنەوەیی، بڵاوکراوە، دابەش‌کراو، بەش‌کردە، بەشینەوەیی، دابەشینی ◌ توزیعی

**distributively** *adverb*
بە شێوەیەکی بڵاوکردنەوەیی یان بەشینەوەیی ◌ بە طور توزیعی

**distributor** /dɪ'strɪbjətə(r)/ *noun*
1 بڵاوکەرەوە، دابەش‌کەر 2 دەزگایێ بۆ ناردنی تەزووی گۆڕاو بۆ مۆم یان شەمی مۆتۆڕی ماشێن، دیلکۆ ◌ 1 توزیع‌کننده، موزع 2 (فنی) دلکو

**district** /'dɪstrɪkt/ *noun*
1 ناوچە، دەڤەر، ناوان، مەڵبەند 2 مەڵبەند، هەرێم، ناوچە (خاوەنی بەڕێوەبەرایەتی یان سنووری خۆی بێ؛ لە فەرەنسی، لە *districtus* لاتین (مەڵبەندی) دادگەری، لە *distringere* لاتین "لێک‌جیابوونەوە، لێک‌دوورکەوتنەوە "draw apart") ◌ 1 منطقه، ناحیه 2 حوزه

**District Attorney** *noun*
دادپرس (DA) ◌ دادستان

**district council** *noun*
ئەنجومەنی ناوچە ◌ شورای منطقه

**district court** *noun*
دادگایێ کە زۆرتر بابەتی نەتەوەیی یان نیشتمانی دەخاتەڕوو تا هی ناوچەیێ ◌ دیستریکت کورت

**district nurse** *noun*
نەخۆشیارێ کە لە ماڵێ سەری نەخۆشەکانی دەدا (ماڵی نەخۆشەکان) ◌ دیستریکت نرس

**distrust** /dɪs'trʌst/ *noun*
بەدگومانی، بەرگومانی، بەگومانی، شک، دوودڵی، دڕدۆنگی، باوەڕپێنەبوویی، بێ‌باوەڕی ◌ سوءظن، بی‌اعتمادی

**distrusted** *adjective*
بەدگومان، بەرگومان، گومان‌بار، گومان‌لێ‌کراو، جێی‌شک، گومان‌لەسەر، گوماناوی ◌ مشکوک

**distrustful** /dɪs'trʌstfl/ *adjective*
بەدگومان، بەرگومان، گومان‌بار، گومان‌لێ‌کراو، جێی‌شک، گوماناوی، دڵپیس، دڵکرمۆڵ، باوەڕپێنەبوویی، بێ‌باوەڕی ◌ ظنین، بی‌اعتماد

**distrustfully** /dɪs'trʌstfəli/ *adverb*
بە شێوەیەکی گوماناوی، دڵکرمۆڵانە ◌ بە طور ظنین

**disturbance** /dɪ'stɜ:bəns, US -'stɜ:rb-/ *noun*
1 پشێوی، ئاڵۆزی، نازاوە، شلەژاوی، شلوقی، شۆڕ، شێواوی، نائارامی 2 مەلۆزمی، هەراسان‌کردن، مزاحیم‌بوون، ئارام لێ‌هەڵگرتن، مایەی نارەحەتی یان هەراسان‌کردن، مەلۆزم 3 شێواوی، ئاخوڕان‌وباخوڕان، گەرەلاوژە، شلەژاوی، پاشاگەردانی، تێکەوڵێکەیی، بێ‌سەرەوبەرەیی، شپرزەیی، تێکچوویی 4 (دەروونناسی) نەخۆشی دەروونی، تێکچوون 5 (ماف) دەس‌درێژی ◌ 1 اغتشاش، آشوب 2 مزاحمت، اسباب ناراحتی 3 آشفتگی، بە هم‌ریختگی 4 (روان‌شناسی) اختلال 5 تعرض

**disturbed** /dɪ'stɜ:bd, US -'stɜ:rbd/ *adjective*
1 (دەروونناسی) نەخۆش 2 نارەحەت،

نیگــەران، دڵــەدوا، شــڵەژاو، شــپرزە ◇ 1 (روانشناسی) بیمار 2 مضطرب، نگران

**disturber** *noun*

ئاژاوەگێڕ، گێرەشێوێن ◇ فتنەانگیز

**disturbing** /dɪ'stɜːbɪŋ, US -'stɜːrb-/ *adjective*

نیگەرانکەر، نارەحەتکەر، شڵەژێنەر: *a disturbing piece of news* ◇ اضطرابآور

**disturbingly** /dɪ'stɜːbɪŋli, US -'stɜːrb-/ *adverb*

نیگەرانکەرانە، نارەحەتکەرانە، بە شێوەیەکی نارەحەتکەر یا نیگەرانکەر ◇ بەطور اضطرابآور

**disubstituted** /dʌɪ'sʌbstɪtjuːtɪd/ *noun*

(کیمیا، دەربارەی گەردێ) خاوەنی دوو کۆمەڵە یان گرووپی پێکهێنەر ◇ دیسابستیتوتید

**disulfiram** /dʌɪ'sʌlfɪram/ *noun*

(پزشکی) ئاوێتەیێکی دەسکرد، بۆ چارەسەری ئەلکۆلیزم بەکاردێتریێ ◇ دیسولفیرام

**disunion** /dɪs'juːnɪən/ *noun*

1 جیابوونەوە، لێکبوونەوە، لێکدابڕان، 2 کێشە، دووبەرەکی، ناتەبایی، ناسازی، ناکۆکی، separation ◇ disunity 1 انفصال، جدایی 2 اختلاف، شقاق

**disunionism** *noun*

جیابوونەوەخوازی، جیاخوازی، جوداگەری ◇ جداییطلبی

**disunionist** *noun*

جیابوونەوەخواز، جیاخواز، جوداگەر ◇ جداییطلب

**disunited** *adjective*

خۆخۆر، ناتەبا، ناساز، ناکۆک، بەکێشەوێستاو، تووشی دووبەرەکیبوو ◇ فاقد اتحاد

**disunity** /dɪs'juːnəti/ *noun*

یەکنەگرتوویی، نایەکیتی، ، دووبەرەکی، چەندبەرەکایەتی، بەکێشەوێستاوی، ناتەبایی، ناسازی، ناکۆکی، خۆخۆری: *disunity within the Conservative party* ◇ عدم اتحاد، اختلاف، شقاق، تفرقه

**disuse** /dɪs'juːs/ *noun*

بەکارنەهێنان، بەکارنەهێنراوی، لەکارنەکردن، وازلێهێنان، وەلانان: *The factory fell into disuse twenty years ago* ◇ عدم استعمال، ترک

**disused** /ˌdɪs'juːzd/ *adjective*

بەکارنەهێنراو، چۆڵکراو، وەلانراو، بەجێهێڵراو، لەکارنەکراو، یەککەوتوو، لەکارکەوتوو، وازلێهێنراو: *a disused station* ◇ متروک

**disutility** /ˌdɪsjuː'tɪlɪti/ *noun*

بێسوودی، بێخێری، بێقازانجی ◇ بیفایدگی

**dissyllabic** /dɪ'sɪləb(ə)l/ *adjective*

دووبڕگەیی، دووکەرتەیی ◇ دوهجایی

**dissyllable** /dʌɪ'sɪləb(ə)l, US 'dʌɪsɪl-/ *noun*, also dissyllable /dɪ'sɪləb(ə)l/

وشەی دووبڕگەیی، پەیڤی دووکەرتەیی ◇ واژەی دوهجایی

**dit** *noun*

(لە سیستمی مۆرسدا) خاڵ ◇ دیت

**ditch** /dɪtʃ/ *noun*

1 جۆگە، چۆمەڵ 2 قوڵکە، کەندال، چاڵ، کەند، کەندەلان، خەنەک، کەندەک (ئەڵمانی بنەڕەت) ◇ 1 جوی، نهر 2 گودال، خندق

**ditheism** /'dʌɪθɪɪz(ə)m/ *noun*

دووخوداباوەڕی ◇ دوخداگرایی

**ditheist** /'dʌɪθɪst/ *noun*

دووخوداباوەڕ ◇ دوخداگرا

**dither** /'dɪðə(r)/ *noun*

1 (نافەرمی) ورووژان 2 دوودڵی، دڕدۆنگی، شک، گومان، گیرخواردوویی، تیاماوی 3 لەرز ◇ 1 هیجان 2 تردید، شک 3 لرز

**dithery** *adjective*

دوودڵ، دڕدۆنگ ◇ مردد

**dithionite** /dʌɪ'θʌɪənʌɪt/ *noun*

(کیمیا) دایتایۆنایت، دیتیۆنیت: خوێیێ کە ئانیۆنی $S_2O_4^{2-}$ تیایە ◇ دیتیونیت

**ditransitive** /daɪ'trænsətɪv, US -'trænz-/ *adjective, noun*

*adj* (کاری) تێپەڕیوی دووبەرکاری *n* کاری تێپەڕیوی دووبەرکاری (هەم ڕاستەوخۆ و هەم ناڕاستەوخۆ، وەکوو *Give me the book*) ◇ *adj* متعدی دومفعولی *n* فعل متعدی دومفعولی

**ditsy** = ditzy

**dittany** /'dɪtəni/ *noun*

1 جاترەکێویلە؟ [*Origanum dictamnus*] (کریت و یۆنان) و جۆرەکانی تر] 2 - gas plant ◇ نعنای کوهی

**ditto** /'dɪtəʊ, US -toʊ/ *adverb, noun* (*pl.* dittos)

1 هەروا، هەروەتر، هەروەها، هەروەسا، ـیش 2 دیتۆ، دۆ (بە واتای هەروەها، وەک سەرێ کە بە نیشانەی (") بۆ دووپاتنەبوونەوە بەکاردێتریێ) 3 ئەرێ، وایە، منیش، باشە (بنەڕەت: گۆڕاوی ئیتالیایی "وتی"، لە dictus لاتین "وتی") detto ◇ 1 همچنین، نیز 2 دیتو، دو 3 موافقم

**ditto mark** *noun*

نیشانەی دیتۆ یان دۆ (") ◇ علامت دیتو

**ditty** /'dɪti/ *noun, pl.* ditties

(بە شۆخی) گۆرانی یا هەڵبەستی کورت و سادە، هەوا، بەند ◇ تصنیف

**ditty bag** *noun*, also ditty box

دەرزیودەزوودان (ب.ت. هی مەلەوان یا ڕاوچی ماسی) ◇ قوتی

**ditz** *noun*

(نافەرمی، ئەمریکا) مرۆی بیربڵاو یان پەریشان

آدم حواس‌پرت ◌
**ditziness** /'dɪtsinəs/ *noun*
بیربلاوی، پەریشانی، گەوجی ◌ حـواس‌پرتـی، حماقت
**ditzy** /'dɪtsi/ *adjective*, also ditsy
(ناقەرمی، ئەمریکا) بیربلاو، پەریشان، گەوج ◌ حواس‌پرت، احمق
**diuresis** /ˌdaɪjʊ(ə)'ri:sɪs/ *noun*
زۆرمیزکردن، میزنی؟، دەڵەمیزی ◌ بوال
**diuretic** /ˌdaɪju'retɪk/ *adjective, noun*
*adj* میز زیادکـەر، میـزن؟: *n diuretic drugs* دەرمـانی میـزن؟ یـان میززیادکـەر، دەرمـانی رەوانی میز ◌ *adj* مدر *n* مادەی مدر
**diurnal** /daɪ'ɜ:nl, US -'ɜ:rnl/ *adjective*
1 رۆژانـە، بـەرۆژ، بـە درێژایـی رۆژ، رۆژبـەرۆژ، هەررۆژە، شەووڕۆژی: *diurnal tasks* 2 (گوڵ) بـە رۆژپـشکوتوو، (بـە) رۆژگـوڵ(کـردوو)، رۆژپـشکوت، رۆژەترەک: *diurnal flowers* 3 رۆژگـەڕ، بـە رۆژدا چالاکە: *diurnal animals* (لە late Latin *diurnalis* لە لاتین *diurnus* لە *dies* "day"، "daily") ◌ 1 یومیـە، روزانـە 2 (گل) روزشکفت 3 دیورنال
**diurnally** /daɪ'ɜ:nəli, US -'ɜ:rnəli/ *adverb*
رۆژانە، رۆژ بە رۆژ ◌ روزانە
**Div** *abbreviation* division, also Div.
بەش، کەرت (ی سـەرەکی) ◌ بخش
**diva** /'di:və/ = prima donna
**divagation** /ˌdʌɪvə'geɪʃn/ *noun*
لادان، لالێ‌تێکچوون، سەرلێ‌شێوان ◌ انحـراف، سرگردانی
**divalent** /dʌɪ'veɪl(ə)nt/ *adjective*
(کیمیـا) دووهـاوهێزە، خـاوەنی دووهـاوهێز ◌ دوظرفیتی
**Divali** = Diwali
**divan** /dɪ'væn, US 'daɪvæn/ *noun*
1 قەنەفـە، تـەخت، کەنەپـە، دیـڤان، تـەختی قەنەفـەیی 2 دیـوانی هەڵبەسـت 3 جێگـای جگەرەکێـشان 4 (مێژوویـی، لـە ئیمپراتـۆری عوسمـانی یـان رۆژهـەڵاتی نێوەڕاسـت) دیـوان، دەسـتەی قـانووندانـەران، ژووری ئەنجومـەن، دادگـای لێکۆڵـینەوە (واتـای 3: بـە ڕێگـای فەرەنسی یان ئیتالیایی لە تورکی، ئەویش لە *dīwān* ئێرانی‌یەوە "register ،anthology" یان "bench ،court") ◌ 1 کاناپە، تخت کاناپـەای 2 دیـوان شـعر 3 جـای اسـتعمال دخانیـات 4 (در امپراتوری عثمانی و خاورمیانە) دیوان
**divan bed** *noun*
تەختی قەنەفەیی ◌ تخت کاناپەای
**divaricate** /dʌɪ'varɪkeɪt, US dɪ-/ *adjective*
لقاوی، پەلاوی، پەل‌پەل ◌ منشعب
**divarication** /dʌɪˌvarɪ'keɪʃn, US dɪ-/ *noun*
1 لق‌لێ‌بوونەوە، پەل‌هاویشتن، لق، پەل، لک 2 (خوازە) جیاوازی، کێشە، جیاوازی بیروڕا ◌ 1 انشعاب 2 (مجازی) اختلاف، اختلاف نظر
**dive** /daɪv/ *noun*
1 لووربـوون، گـوژین، خۆتـێ‌خـستن، خۆتێ‌هەڵکردن 2 تێ‌ڕژان، خۆپیاکردن، هێرش 3 هاتنەخوارەوەی کتوپڕ، داشکانی لەپڕ (نرخ و هتد) 4 جێگای خراپ (مەی‌خانە و هتد) ◌ 1 شیرجە 2 هجوم 3 کاهش ناگهانی 4 جای بدنام
**dive-bomber** *noun*
فڕۆکەی خۆتێ‌هەڵکەر و بۆمب‌ڕێژ ◌ دایوبومبر
**diver** /'daɪvə(r)/ *noun*
1 مەلـەوان 2 خۆتـێ‌هەڵـکەر، خۆتـێ‌خـەر، خۆلوورکـەر 3 جـۆرێ باڵـندەی ئـاوی دەنووک‌تیژی راست [*Gavia immer* (هـی گـەورەتری بـاکووری یـان loon ی ئاسـایی) و جۆرە پێوەندی‌دارەکان، خێزان Gaviidae] ◌ 1 غواص 2 شیرجەزن 3 نوعی پرندەی آبی
**divergence** /daɪ'vɜ:dʒəns, US -'vɜ:rdʒ-/ *noun*, also divergency -dʒəns/
1 دووری، مـەودازۆری، لاری، لادان، لق‌لێ‌بوونەوە، پـەل‌هاویشتن 2 لێک‌دووری 3 جیاوازی، دژایەتی، ناکۆکی، ناتەبایی: *a wide divergence of opinion* 4 لێک‌دووری ◌ 1 فاصـلە، انشعاب 2 تباعد 3 تباین، اختلاف 4 واگرایی
**divergent** /-dʒənt/ *adjective*
1 دوور، مەودازۆر، لار، دوورلەیەک، لێک‌دوور، لاداو، لقـاوی، پـەل‌هاویـشتوو 2 جیـاواز، دژ، نـاکۆک، ناتـەبا: *divergent paths/opinions* ◊ *the divergent interests of capital and labour* 3 لێک‌دوور: *a divergent lens* ◌ 1 متباعد، مختلف، منشعب 2 متباین 3 واگرا
**divergently** /daɪ'vɜ:dʒəntli, US -'vɜ:rdʒ-/ *adverb*
لێک‌دوورانە، بە شێوەیەکی لێک‌دوور ◌ بە طور متباعد
**divers** /'daɪvəz, US vərz/ *adjective*
1 (کـۆن، وێژەیـی) جیـاواز، جۆراوجـۆر، جەستەجەستە، جیاجیا 2 چەندین، چەند، فرە، زۆر ◌ 1 مختلف، گوناگون 2 چندین، متعدد
**diverse** /daɪ'vɜ:s, US -'vɜ:rs/ *adjective*
جیاواز، جۆراوجۆر، جەستەجەستە، هەمـەرەنگ، هەمەبابـەت، جیاجیـا، unlike: *people with diverse interests* ◌ مختلف، گوناگون
**diversely** /daɪ'vɜ:sli, US -'vɜ:rs/ *adverb*
بە شێوەیەکی جیاواز، بە شـێوەیەکی جۆراوجـۆر ◌ بە طور گوناگون
**diversification** /daɪˌvɜ:sɪfɪ'keɪʃn, US -ˌvɜ:rs-/ *noun*
جیـاوازی، لێـک‌جیـایی، جۆراوجـۆری،

جۆربەجۆری، جەستەجەستەیی ۞ گوناگونی. تنوع
**diversiform** /dɪˈvɜːsɪfɔːm/ *adjective*
جیاواز، جۆراوجۆر، جەستەجەستە، جیاجیا ۞ گوناگون
**diversion** /daɪˈvɜːʃn, US -ˈvɜːrʒn/ *noun*
1 لاگۆڕین، پێچان، لادان 2 سەرقاڵی، رابواردن، خەریکی، خافڵان 3 مایەی سەرنجڕاکێشان، مایەی هۆش‌لانەمان 4 کردەوەی لادەرانە یان رێهەڵەکەر 5 (سەربازی) هێرشی رێهەڵەکەر یان سەرلێ‌تێکدەرانە 6 (خوازە) جیاوازی ۞ 1 تغییر مسیر، انحراف 2 سرگرمی، مشغولیت 3 موجب حواس‌پرتی 4 عمل انحرافی 5 عملیات انحرافی 6 اختلاف
**diversionary** /daɪˈvɜːʃənəri, US -ˈvɜːrʒəneri/ *adjective*
بەهەڵەدابەرانە، رێهەڵەکەرانە، سەرلێ‌تێکدەرانە ۞ انحرافی
**diversity** /daɪˈvɜːsəti, US -ˈvɜːrs-/ *noun, pl.* diversities
1 جۆراوجۆری، هەمەڕەنگی، جۆربەجۆری، جیاجیایی، جیاوازی، جەستەجەستەیی 2 جیاوازی، ناتەبایی، کێشە، ناکۆکی 3 جۆر، ئاوا، چەشن، رەنگ ۞ 1 گوناگونی 2 اختلاف 3 نوع
**diverticula** = plural form of diverticilum
**diverticular** /ˌdʌɪvəˈtɪkjʊlə/ *adjective*
1 سەربە diverticulum 2 سەرقاڵکەر، خافڵێنەر ۞ مشغول‌کننده
**diverticulitis** /ˌdʌɪvəʊɪkjʊˈlʌɪtɪs/ *noun*
(پزشکی) هەلاوسانی یەک یان چەند diverticula ۞ التهاب وارِاهه
**diverticulosis** /ˌdʌɪvətɪkjʊˈləʊsɪs/ *noun*
(پزشکی) دۆخێ کە لەودا کیسەکوێرەکان لەنێو ریخۆڵە دان بەبێ نیشانەیێ diverticilua هەلاوسان inflammation ۞ دیورتیکیولوز
**diverticulum** /ˌdʌɪvəˈtɪkjʊləm/ *noun, pl.* diverticula /-lə/
1 لاڕێ، لاڕێگا 2 کیسەکوێرە، لاڕێیە: زیادی یان کیسەیێکی نائاسایی و کوێر و لوولەیی کە لە کانال یان بۆشاییێ لێ‌دەبێتەوە و هۆی پەیدابوونەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ پسانی herniation توێی لێنجەپەردەیی mucosal بەنێو دیوارەی ماسوولکەیی کۆلۆن ۞ 1 جادەی فرعی 2 وارِاهه
**divertimento** /dɪˌvɔːtɪˈmɛntəʊ, -ˌvɛːt-/ *noun, pl.* divertimenti /-ti/ or divertimentos
(موسیقا) دایڤێرتیمێنتۆ، هاوشێوەی serenade ۞ دیورتیمنتو
**diverting** /daɪˈvɜːtɪŋ, US -ˈvɜːrt-/ *adjective*
(فەرمی) سەرقاڵکەر، سەرگەرمکەر، خافڵێنەر، ۞ *a diverting evening* :amusing مشغول‌کننده، سرگرم‌کننده
**divertingly** /daɪˈvɜːtɪŋli, US -ˈvɜːrt-/ *adverb*
سەرقاڵکەرانە، سەرگەرمکەرانە، خافڵێنەرانە ۞ به طور مشغول‌کننده
**divertissement** /dɪˈvɜːtɪsmənt, US ˌdiːvɛːˈtiːsmɒ̃/ *noun*
سەرقاڵی، خافڵان، سەرگەرمی ۞ سرگرمی
**Dives** /ˈdʌɪviːz/ *noun*
(وێژەیی) پیاوی دەوڵەمەندی (وادانراو، ناوی پیاوێکی دەوڵەمەندی ئینجیلی لوقا 31-16:19) ۞ مرد ثروتمند
**divestiture, divesture** = disinvestment
**divestment** /daɪˈvestmənt/ = disinvestment
**divide** /dɪˈvaɪd/ *noun*
1 جیاوازی، کێشە، ناکۆکی، ناتەبایی، ناسازی، کەلێن، سنوور 2 خاڵی وەرچەرخان 3 (جوگرافیا) ئاوەڕێژ (watershed یش)، دابەشگەی ئاو ۞ 1 اختلاف، شکاف، مرز 2 نقطه‌عطف 3 آب‌پخشان
**divided** /dɪˈvaɪdɪd/ *adjective*
1 بڵاوەبوو، جیاوەبوو، پرش‌وبڵاو، جیاجیا، تووشی چەندبەرەکی‌بوو، دابەش‌کراو، بەش‌بەش‌کراو، لێک‌هەڵوەشاو، لێک‌ترازاو 2 دوودڵ، دڕدۆنگ ۞ 1 پراکنده، متشتت، تقسیم‌شده 2 مردد
**divided highway** = dual carriageway
**dividend** /ˈdɪvɪdend/ *noun*
1 (بیرکاری) دابەش‌کراو 2 خێر یان قازانجی بەش یان بەشەکان (شار یان شارەکان): 3 *dividend payments of 50 cents a share* بەشێ تاکێ لەو پارەیە 4 باشی، خاڵ، قازانج، خەڵات، پاداشت ۞ 1 مقسوم 2 سود سهم یا سهام 3 سهم فرد از این پول 4 مزیت، پاداش
**divider** /dɪˈvaɪdə(r)/ *noun*
1 شتێ جیاکەرەوە، جیاکار، بەربەست 2 دابەش‌کەر، بەش‌کەر 3 (dividers) پەرگاری دابەش‌کردن، پرگار یان پەرگاری پێوەر: *a pair of dividers* ۞ 1 عامل جدایی، حاجز 2 بخش‌گر 3 (در جمع) پرگار تقسیم
**dividing line** *noun*
هێڵی جیاکەرەوە، نیشانەی جیاکردنەوە، جیاکار، سنوور، رادە؛ شوێنێ کە دوو ناوچە لێک جیا دەکاتەوە یا دادەبڕێ: *There is no clear dividing line between what is good and what is bad* ۞ حد فاصل، مرز
**divi-divi** /ˈdɪvɪˌdɪvi/ *noun, pl.* divi-divis
1 داری چکۆلەی دانەوێڵەیی گەرمێنانی ئەمریکا، کەلووەکانی لوولن [ *Caesalpinia coriaria*] 2 ئەم کەلووانە کە سەرچاوەیێکی گەورەی tannin ن ۞ دیوی‌دیوی

**divination** /ˌdɪvɪˈneɪʃn/ *noun*
پێشزانی، غەیبزانی، داهاتووبینی، فاڵگرتنەوە، راوێژی دروست ۞ غیب‌گویی، تفأل

**divinatory** /dɪˈvɪnətəʊrɪ/ *adjective*
سەربە پێشزانی یان غەیبزانی، غەیبزانانە، داهاتووبینانە ۞ وابسته به غیب‌گویی، غیب‌گویانه

**divine** /dɪˈvaɪn/ *adjective, noun*
1 *adj* خودایی، یەزدانی، ئاسمانی، ئەهورایی، ئایینی، دینی: *-ine law/love/will* 2 (ئاقەرمی) یەکجار باش، هەرەچاک، سەیر، مەحشەر: *That mango tasted divine!* 1 *n* (the Divine) ویستی خودا(یی) 2 (کۆن) پیاوی ئایینی، ئایینەوان، قەشە ۞ 1 *adj* الهی، ربانی، ملکوتی، الوهی، روحانی، ربوبی، مذهبی 2 (عامیانه) معرکه 1 *n* مشیت الهی 2 روحانی، کشیش

**divine action** *noun*
کردەوەی خودایی، کاری خودایی ۞ فعل الهی

**divine being** *noun*
بوونی خودایی ۞ وجود الهی

**divine benevolence** *noun*
خێرخوازی خودایی، چاکەویستی خودایی ۞ خیرخواهی الهی

**divine creation** *noun*
دروستبوونی خودایی، ئافراندنی خودایی ۞ خلق الهی

**Divine Liturgy** *noun*
رێورەسم یان ئاهەنگی شێوی خواوەندی the Eucharist ب.ت. لە کلێسەی ئۆرتۆدۆکس ۞ مراسم عشاء ربانی

**divinely** /dɪˈvaɪnli/ *adverb*
لە لایەن خوداوە ۞ از جانب خدا

**divine names** *noun, pl.*
نێوەکانی خودا، ناوە خوداییەکان ۞ اسماء الهی

**Divine Office** *noun*
ئاهەنگی نوێژ و خواپەرستی بۆ کردنی کارێکی گرنگ، بەڕێوەبردن یان راپەڕاندنی رێورەسمی دینی ۞ آفیس دیواین

**diviner** /dɪˈvaɪnə(r)/ *noun*
پێشزان، غەیبزان، داهاتووبین (ناوی ژێرعەرز بە گۆچانی غەیبزانی) ۞ غیب‌گو

**divine revelation** *noun*
وەحی خودایی ۞ وحی الهی

**divine right** *noun*
1 مافی خودایی (لە لایەن خوداوە دەدرێ بە شا یان شازن و نابێ بەرهەڵستی لەگەڵ بکرێ) 2 مافی خۆ یان مۆزگەر، مافی خودایی (بۆ لێپرسین نەبێ) ۞ 1 حق الهی 2 حق مسلم

**divine right of kings** *noun*
مافی خودایی پاتشاکان (راستەوخۆ لە لایەن خوداوە نەک بە پێی رەزامەندی خەڵک) ۞ حق الهی سلاطین

**divine science** *noun*
زانستی خودا(یی) ۞ علم الهی

**divine unity** *noun*
یەکێتی خودا(یی) ۞ وحدت الهی

**divine veracity** *noun*
راستی خودایی ۞ صداقت الهی

**divine will** *noun*
ویستی خودا(یی) ۞ ارادەی الهی

**divine word** *noun*
وشەی خودا ۞ کلمه‌الله

**diving** /ˈdaɪvɪŋ/ *noun*
1 مەلەوانی 2 لووربوون، گوژین، خۆتێخستن، خۆتێهەڵکردن ۞ 1 غواصی 2 شیرجه

**diving beetle** *noun*
قالۆنچەمەلەوانە (هەوا لەژێر توورەکەی بنباڵی هەڵدەگرێ و دەچێتە ژێرئاو [خێزان Dytiscidae: گەڵی جۆرن]) ۞ نوعی سوسک

**diving-bell** *noun*
دەزگای مەلەوانی ۞ آلت غواصی

**divingboard** *noun*
تەختەباز، تەختەی مەلەوان، تەختەی لووربوون ۞ تخته‌شیرجه

**diving duck** *noun*
مراوییەمەلەوانە (وەک pochard و goldeneye) ۞ نوعی مرغابی

**diving suit** *noun*
(جل‌و)بەرگی مەلەوانی ۞ لباس غواصی

**divining-rod** *noun*
میلی گومانە، میلە یان گۆچانی غەیبزانی یان پێشزانی، میلە یان گۆچانی ئاودۆزینەوە ۞ عصای غیب‌گویی

**divinity** /dɪˈvɪnəti/ *noun, pl.* divinities
1 خوداێتی، خودایەتی، خوایەتی، یەزدانێتی 2 خوا، خودا، خواژن: *Roman/Greek/Egyptian -nities* 3 یەزدانناسی، دینناسی، تیۆلۆژی، ئایینەوانی، دینەوانی 4 (the Divinity) کردگار، خوا، خوداوەند ۞ 1 الوهیت، ربانیت، خدایی 2 اله، الهه 3 الهیات 4 (the Divinity) پروردگار

**divinization** *noun*
بەخودابوون، بوونەخودا ۞ تأله

**divisibility** /dɪˌvɪzəˈbɪlɪtɪ/ *noun*
لەدابەش(بوون)هاتوویی، دابەشیوی ۞ بخش‌پذیری، قابلیت تقسیم

**divisible** /dɪˈvɪzəbl/ *adjective*
لەدابەش(بوون)هاتوو، بەش دەکرێ، دابەش دەکرێ، دابەشیو: *8 is divisible by 2 and 4, but not by 3* ۞ بخش‌پذیر، قابل تقسیم

**divisibly** /dɪˈvɪzəbli/ *adverb*
بە شێوەیێ کە بەش بکرێ ۞ به طور بخش‌پذیر

**division** /dɪˈvɪʒn/ *noun*
1 دابەشاندن، دابەشکردن، بەشکردن،

پارقەکر(د)ن، دەستە(دەستە)کردن، پۆلاندن، بەشاندن، بەش‌بەش‌کردن، کەرت(کەرت)کردن، قاش‌کردن: *the division of ◊ cell division the ◊ the population into age groups* 2 کەرت، بەش، پشک، پار *division sign (÷)* 3 کێشە، دژایەتی، جیاوازی، ناتەبایی، ناسازی، من‌وتۆیی، کەلێن، کەلەبەر، دووبەرەکایەتی: *the work of healing the divisions within society ◊ social/class divisions* 4 (ب.ت. لە پارلێمانی بریتانیادا) دەنگ‌دان 5 سنوور، هێڵی جیاکردنەوە، جیاکار 6 (سەربازی) لەشکر، سپا، تمەن: *the Guards Armoured Division* 7 (رووەک‌ناسی، لە پۆلاندنا، لەژوور class و لەژێر kingdom، بەرامبەر بە phylum لە گیانەوەرناسیدا) دیڤیژن، پار، بەش 8 (گیانەوەرناسی) هەر دەستەیێکی لاوەکی نێوان ئاستە گەورەکانی پۆلاندن ○ 1 تقسیم، تقسیم‌بندی 2 بخش، قسمت، سهم 3 اختلاف، شکاف، تفرقه 4 رأی‌گیری 5 حدفاصل 6 (نظامی) لشکر 7 و 8 دیویسیون

**divisional** /dɪ'vɪʒənl/ *adjective*

1 سەربە بەش، بەشی، کەرتی، سەربە کەرت 2 سەربە لەشکر یان سپا، پێوەندی بە سپاوە هەیە: *the divisional commander/headquarters* ○ 1 وابسته به بخش 2 وابسته به لشکر

**divisionalization** *noun*

دابەشاندن یا دابەش‌کردن بەسەر چەندین کەرتی جیاجیادا (رێکخراوەیی) ○ دیویسیونالیزاسیون

**division bell** *noun*

(لە پارلەمانی بریتانیادا) زەنگی راگەیاندنی دەنگ‌دان ○ زنگ اعلان رأی‌گیری

**divisionism** = pointillism

**division lobby** *noun*

(لە پارلەمانی بریتانیا) یەکێ لە دوو جێگا یان شوێنی دەنگ‌دان (ی ئەندامانی پارلەمان) ○ یکی از دو جایگاه رأی‌گیری

**division of labour** *noun*

(دا)بەش‌کردنی کار، کاربەشاندن ○ تقسیم کار

**division of power** *noun*

(دا)بەش‌کردنی هێزەکان ○ تفکیک یا تقسیم قوا

**division sign** *noun*

نیشانەی (دا)بەش‌کردن، نیشانەی کەرت‌کردن (÷) ○ علامت تقسیم

**divisive** /dɪ'vaɪsɪv/ *adjective*

دووبەرەکی‌نەرەوانە، مایەی ناتەبایی و دووبەرەکی، کێشەنەرەوانە: *a -e issue ◊ He believes that unemployment is socially -ve* ○ تفرقه‌انگیز

**divisively** /dɪ'vaɪsɪvli/ *adverb*

دووبەرەکی‌نەرەوانە، کێشەنەرەوانە، بە شێوەیێ کە ببێتە مایەی کێشە ○ به طور تفرقه‌انگیز

**divisiveness** /dɪ'vaɪsɪvnəs/ *noun*

کێشەنانەوە، دووبەرەکی‌خستنەوە، ناتەبایی‌نانەوە ○ تفرقه‌انگیزی

**divisor** /dɪ'vaɪzə(r)/ *noun*

بەسەردابەش‌کراو، دابەش‌کردە ○ بخش‌یاب، مقسوم‌علیه

**divorce** /dɪ'vɔːs, US dɪ'vɔːrs/ *noun*

1 تەلاق، جیابوونەوە، بەردان 2 دەستووری قانوونی تەلاق 3 جیابوونەوە، دابڕان، دابڕانی پێوەندی 4 هەڵوەشانەوە، بەتاڵ‌بوونەوە ○ 1 طلاق 2 حکم قانونی طلاق 3 جدایی، قطع رابطه 4 فسخ

**divorced** /dɪ'vɔːst, US -'vɔːrst/ *adjective*

1 (ژنی) تەلاق‌دراو، بەردراو، بێوە (چ ژن و چ پیاو): *My parents are divorced* 2 جیا، دابڕاو، بێ‌پێوەندی، لێک‌دابڕاو، لێک‌هەڵبڕاو: *He seems completely divorced from reality* ○ 1 مُطلّقه، بیوه (مرد یا زن) 2 جدا، منفک

**divorcee** /dɪˌvɔː'siː , US dɪˌvɔːr'seɪ/ *noun*, US masc. divorcé, *fem.* divorcée /-'seɪ/

1 ژنی تەلاق‌دراو، بێوەژن 2 بێوەمێر، بێوەپیاو ○ 1 زن مطلقه 2 مرد بیوه

**divorcement** *noun*

جیابوونەوە، دابڕان، لێک‌کرانەوە ○ جدایی

**divulgation** /ˌdɪvəl'eɪʃən/ *noun*, also divulgence

لەقاودان، بڵاوکردنەوە، دەربڕین، راستی‌لێ‌وتن، دەرخستن، درکاندن، ئاشکراکردن ○ افشا، افشاگری

**divulsion** /dɪ'valʃən/ *noun*

هەڵکەندن، دەرکێشان (بە توندی)، شەق‌وپەق‌کردن، لێک‌وەزەبەردان ○ قمع، دیوالسیون

**divvy** /'dɪvi/ *noun*, *pl.* divvies, also divi

(نافەرمی، بریتانیا) مرۆی گەوج ○ آدم احمق

**Diwali** /diː'wɑːli/ *noun*, also Divali

دیوالی، پاییزەسوورە، پاییزەسووران (فێستیڤاڵی هیندی، پاییزان بەڕێوەدەچێ) ○ دیوالی

**diwan** /dɪ'wɑːn/ *noun*, also dewan

دیوان: گەورەکاربەدەستی دارایی، وەزیری دارایی یان سەرۆک‌وەزیر لە هێندێ هەرێم یان ئەیالەتی هیندا ○ دیوان

**Dixie** /'dɪksi/ *noun*

(لە ئەمریکا) باشوور، ئەیالەتە باشووری‌یەکان، هەرێمەکانی باشوور یان خواروو (ب.ت. سەرویەندی شەڕی نێوخۆیی) ○ دیکسی

**dixie** /'dɪksi/ *noun*, *pl.* dixies

مەنجەڵ، قازان، بەرۆش ○ دیگ

**Dixieland** /'dɪksilænd/ *noun*

1 شێوازیکی موسیقای جاز (بە ترپە و ریتمێکی توندەوە، لە بنەڕەتا لە نیوئۆرلینز New Orleans سەرچاوەی گرتووە) 2 = Dixic ○ دیکسی‌لند

**dixit** *noun*
وته، قسه، گوته ◌ گفته
**DIY** /ˌdiː aɪ ˈwaɪ/ *abbreviation* do-it-yourself
خۆت چاکی کەوە، خۆت بیکە (خۆچاککردن یان خۆچاککردنەوەی ئەو شتانەی کە خراپ بوون) ◌ دیآیوای
**dizygotic** /ˌdʌɪzʌɪˈgɒtɪk/ *adjective*
(دوانەکان) لە دوو هێلکۆکە گوورراون ◌ دیزیگوتیک
**dizygous** /dʌɪˈzʌɪgəs/ = dizygotic
**dizzily** /ˈdɪzɪli// *adverb*
بە سەرەگێژەوە ◌ با سرگیجە
**dizziness** /ˈdɪzinəs/ *noun*
سەرەگێژە، سەرگێژە، سەرەخولێ، سەرەسوورە، تاس ◌ سرگیجە
**dizzing** *adjective*
شتێ کە سەرەگێژەی پێوەبێ، سەرەسوورەهێنەر ◌ سرگیجەآور
**dizzy** /ˈdɪzi/ *adjective* (dizzier, dizziest)
1 شتێ کە سەرەگێژەی پێوەبێ 2 سەرەگێژەگرتوو، تووشی سەرەسوورەبوو، گێژ، ور، کاس 3 (نافەرمی) گەوج، بێمێشک ◌ 1 سرگیجەآور 2 سرگیجەگرفتە، گیج 3 (عامیانە) احمق
**DJ** /ˈdiː dʒeɪ/ *abbreviation* 1 disc jockey 2 dinner jacket
**djellaba** /ˈdʒɛləbə/ *adjective, also* djellabah or jellaba
جۆرێ عەبای کڵاوداری فشی لەخوری، بە شێوەیێکی نەریتی عەرەبەکان دەیپۆشن (بنەرەت: لە *jellāba* *jellābiyya* عەرەبی مەراکیشی) ◌ جلبا
**djibba** = jibba
**djibbah** = jibba
**Djiboutian** /dʒɪˈbuːtiən/ *noun, adjective, also* Jibutian
*n* خەڵکی Djibouti لە باکووری رۆژهەڵاتی کەناری ئەفریکا، جیبوتیایی *adj* سەربە جیبوتی، جیبوتیایی ◌ جیبوتی
**djinn** /dʒɪn/ *noun,* variant spelling of jinn
**dl** *abbreviation* decilitre
**D-layer** *noun*
نزمترین توێی ئایۆنۆسفێر، ئەتوانێ شەپۆلە رادیۆیییەکانی لەرەنزم بداتەوە ◌ دیلایر
**D-lock** *noun*
قوفڵی چەڵەمەیی یان ئاوزەنگییانە (هی چەرخ و مۆتۆر) ◌ قفل دی
**DLitt** *abbreviation* Doctor of Letters
1 دوکتۆرای وێژە 2 بڕوانامەی دوکتۆرای وێژە ◌ 1 دکترای ادبیات 2 درجەی دکتری ادبیات
**dm** *abbreviation* decimetre
**DM** *abbreviation* Deutschmark
**DMus** *abbreviation* Doctor of Music
1 دوکتۆرای موسیقا 2 بڕوانامەی دوکتۆرای موسیقا ◌ 1 دکترای موسیقی 2 درجەی دکتری موسیقی
**DNA** /ˌdiː en ˈeɪ/ *abbreviation* *d*eoxyribo*n*ucleic *a*cid
دیئێنئەی، دیئێنئێی ئەسید (= پێکهاتەیێ کە زانیاری ژێنێتیکی genetic information لە خانەی زیندەوەراندا هەڵدەگرێ) ◌ دیانای آ
**DNA profiling** *noun,* also DNA fingerprinting
تاقیکردنەوەی DNA (بۆ دۆزینەوەی تاوانکار) ◌ دیانای پروفیلینگ
**DNase** /ˌdiːɛnˈeɪz/ *noun*
(زیندەکیمیا) هەوێنە (enzyme)یێ کە DNA تێکدەشکێنێ بۆ گەردە چکۆلەترەکان ◌ دینیز، دیانآز
**DNA virus** *noun*
ڤایرۆسێ کە ژێنۆمەکەی لە دیئێنئەی پێکهاتووە ◌ ویروس دیانآ
**do**[1] /duː/ *noun*
1 (نافەرمی) میوانی 2 (نافەرمی) فێڵ، دەهۆ، تەڵەکە ◌ 1 (عامیانە) مهمانی 2 (عامیانە) حقە، کلک
**do**[2] /dəʊ, US doʊ/ *noun*
(موسیقا) یەکەمین و دوایەمین نۆت، بەپێی پەیژەی سۆلفێژ ◌ دو
**do**[3] *noun,* also ditto
1 هەروا، هەروەتر، هەروەها، هەروەسا، ـیش 2 دیتۆ، دۆ (بە واتای هەروەها، وەکوو سەرێ کە بە نیشانەی (") بۆ دووپاتنەبوونەوە بەکاردێتێ) ◌ همچنین، نیز، دیتو، دو
**doable** /ˈduːəbl/ *adjective*
کردەنی، لەکردنهاتوو، دەکرێ، ئەکرێ، ئەشێ ◌ کردنی
**d.o.b.** *abbreviation* date of birth
رێکەوتی (لەدایکبوون) ◌ تاریخ تولد
**dobbin** /ˈdɑːbɪn/ *noun*
بارگینی کۆن، ئەسپ یان بارگیری کێڵگە ◌ یابوی فرسودە یا مزرعە
**dobe** /ˈdəʊbi/ = adobe
**Doberman** chiefly N. American = Dobermann
**Dobermann** /ˌdəʊbəmən, US ˌdoʊbərmən/ *noun,* also Dobermann pinscher /ˈpɪnʃə/
دوبێرمەن: جۆرێ سەگی زلەی تووکدرێژ، زۆرتر بۆ بەردەرگای ماڵان رایدەگرن، زۆرتر رەش، لە ناوی نژادی سەگی ئەڵمانی Ludwig Dobermann (+ Pinscher ئەڵمانی "terrier"

و خیابان 5 قابلیت 6 ضربه 7 شور و شوق 8 (روان‌شناسی) سائق 9 حمله 10 تلاش همه‌جانبه 11 انتقال نیرو 12 (کامپیوتر) درایو

**drive-in** *noun, adjective*
درایف‌ئین، سوارە، سواری (سینەما، خواردنگە و هتد) ۞ دراوین

**drivel** /ˈdrɪvl/ *noun*
شرم‌وبرم، هەلیت‌وپلیت، فلتەفلت، فلچەفلچ ۞ چرت و پرت

**driven** /ˈdrɪvn/ = past participle of drive

**driver** /ˈdraɪvə(r)/ *noun*
1 شۆفیر، لێخوڕ، ئاژۆتکار 2 دار (گۆلف) ۞ 1 راننده 2 چوب

**driver ant** = army ant

**driver's licence** *noun*
دەستوورنامەی لێخوڕین یان راندن ۞ گواهی‌نامەی رانندگی

**drive-shaft** /ˈdraɪvʃɑːft, US -ʃæft/ *noun*
میل‌گاردان، ستوونی سووڕاندن یان سووڕێنەر (هێز لە مۆتۆرەوە رادەگوێزێتە پێچکە و چەرخەکان) ۞ میل‌گاردان

**driver's seat** *noun*
ناوەندی دەس‌بەسەرداگرتن، کۆنترۆڵگە، مەهارگە، ناوەندی کۆنترۆڵ ۞ مرکز مهار

**drive-through** *adjective*
درایف‌ئین، سوارە، سواری ۞ دراوین

**driveway** /ˈdraɪvweɪ/ *noun*
ڕێگای نێوان ماڵ و شەقام ۞ راه میان خانه و خیابان

**driving**[1] /ˈdraɪvɪŋ/ *noun*
شۆفیری، لێخوڕین، ئاژۆتن، ئاژووتن، راندن، رانین ۞ رانندگی

**driving**[2] /ˈdraɪvɪŋ/ *adjective*
1 جووڵێنەر، سووڕێنەر، بزوێنەر 2 کاریگەر، شوێن‌دانەر، دەس‌ڕۆیشتوو، کارتێکەر 3 توند، توندوتیژ، سەخت 4 (باران، بەفر و هتد) توند، قورس ۞ 1 گرداننده 2 مؤثر 3 شدید 4 (باران، برف و...) تند

**driving belt** *noun*
تاسمەی جووڵێنەر، قایش یان تەسمەی سووڕێنەر ۞ تسمەی گردان

**driving door** *noun*
درگای لای شۆفیر، درگای دەسی لێخوڕ ۞ در طرف راننده

**driving licence** *noun*
دەستوورنامەی لێخوڕین ۞ گواهی‌نامەی رانندگی

**driving school** *noun*
فێرگەی لێخوڕین ۞ آموزش‌گاه رانندگی

**driving seat** *noun*
کورسی لێخوڕ یان شۆفیر ۞ صندلی راننده

**driving test** *noun*
تاقیکردنەوەی شۆفیری یان لێخوڕین ۞ آزمایش رانندگی

**driving time** *noun*
ماوەی شۆفیری یان لێخوڕین ۞ زمان رانندگی

**driving wheel** *noun*
پێچکەی سووڕێنەر یان جووڵێنەر، پێچکەی راماڵین ۞ چرخ گرداننده

**drizzle** /ˈdrɪzl/ *noun*
پرووشە، رشێن، تەپ‌ونم، نمنمەی باران، خناف، نەرمەباران، سووکەباران ۞ نم‌نم باران

**drizzly** /ˈdrɪzli/ *adjective*
بارانی، (باران) ورد، نەرم، نمنمە ۞ بارانی، نم‌نم

**drogue** /drəʊg/ *noun*
1 (دەریاوانی) لەنگەری قووچکەیی یان چەتری 2 ئامێرێ بە شێوەی قووچکە بە دوای گەمی، فڕۆکە و...، ب.ت. بۆ کەم‌کردنەوەی خێرایی یان راگرتنی لەنگەر و هاوسەنگی ۞ دروگ

**droid** /drɔɪd/ *noun*
1 (لە چیرۆکی زانستی‌دا) رۆبات، رۆبۆت 2 (کامپیوتێر) بەرنامەیێ کە خۆبەخۆ بەردەبێتە کۆکردنەوەی زانیاری لە دەزگا یان سیستمە دوورەکان (بنەڕەت: کورتەی android) ۞ 1 آدم‌واره 2 درویڈ، درونید

**droit** /drɔɪt/ *noun*
(مێژوویی، ماف) ماف، حەق ۞ حق

**droll** /drəʊl, US drəʊl/ *adjective, noun*
*adj* پێکەنینی، گاڵتەجار، بەزم: *So they've locked me out of the house? Very droll, I'm sure!* *n* مرۆی بەزم یان شۆخی‌باز یان پەند ۞ *adj* مضحک *n* آدم بذله‌گو

**drollery** /ˈdrəʊləri, US ˈdrəʊl/ *noun, pl.* drolleries
گاڵتەجاری، گاڵتە، شۆخی، جەفەنگ ۞ مسخرگی، مزاح

**drollness** *noun*
1 گاڵتەجاری، شۆخی‌بازی، گاڵتە، شۆخی، جەفەنگ 2 شتی پێکەنینی، شتی پەن(د) و مەسخەرە ۞ 1 مسخرگی، مزاح 2 چیز خنده‌دار

**dromaeosaur** /ˈdrəʊmɪə(ʊ)sɔː/ *noun*
تیژمێلکە؟، دایناسۆرێکی دووپێی گۆشت‌خۆر، لە کۆمەڵێ کە deinonychus و velociraptor ی تیایە (بنەڕەت: لە *Dromaeosauridae* لاتینەوە (ناوی خێزانی)، لەسەر بنچینەی *dromaios* یۆنانی "swift-running" + *sauros* "lizard") ۞ درومامسور

**-drome** *suffix*
پاشگر: گۆرەپان، مەیدان، بنکە: *velodrome*، *motordrome*، *aerodrome* (بنەڕەت: لە *dromos* یۆنانی‌یەوە، بڕوانە dromos) ۞ پسوند: میدان، پایگاه

**dromedary** /ˈdrɒmədəri, US

'dra:mədəri/ *noun, pl.* dromedaries
وشتری یەککۆپارە، وشتری یەکدووگە، وشتری عەرەبی (ب.ت. بۆ سواری یان غار؛ بەرەت: ئینگلیسی نێوەڕاست: لە *dromedaire* فەرەنسی کۆن یان لە *dromedarius* late Latin *(camelus)* "وشتری گورج یان چابک"، لەسەر بنچینەی *dromad- dromas* یۆنانی "راکەر") ◌ جمازه

**dromond** *noun*
جۆرێ کەشتیی شەڕکەر یان کارداری سەدەکانی نێوەڕاست ◌ دروموند

**dromos** /'drɒmɒs/ *noun, pl.* dromoi /-mɔɪ/
1 ڕێڕەو یان ڕێگای دوولایەیکەر بۆ نێو بەرسگە یان گڵکۆێ یۆنانی کۆن 2 گۆڕەپانی ئەسپسواری ◌ دروموس

**-dromous** *suffix*
پاشگر: راکەر: *catadromous* ◌ پسوند: دونده

**drone** /drəʊn, US droʊn/ *noun*
1 ویزەویزە، هارەهار، دەنگی ویزە 2 مێشەنگوینی نێر، بەم، هەنگی نێر 3 مرۆی سەربار، مرۆی لاخور یان مشەخۆر، لەسە زگی خەڵکەوەراو، تەوەزەل، لەشگران، خویڕی 4 فڕۆکەی دوورەکۆنترۆڵی بێفڕۆکەوان ◌ 1 زوزه، صدای وزوز 2 زنبور عسل نر 3 آدم انگل، تنەلش 4 درون

**drone fly** *noun*
جۆرێ hoverfly شێوەی هەنگ دەدا [*Eristalis tenax*] ◌ درون فلای

**drongo** /'drɒŋgəʊ/ *noun, pl.* drongos or drongoes
1 جۆرێ باڵندەی دەنگخۆشی پۆپنەی کلکدرێژ، لە ئەفریکا، باشووری ئاسیا و ئەوستراليا دەبینرێ [خێزان Dicruridae: چەندین جۆرن] 2 (نافەرمی، زۆرتر لە ئەوستراليا و نیوزیلەند) مرۆی گەوج و بێدەسەلات ◌ 1 نوعی پرنده 2 آدم احمق و بیعرضه

**droob** /dru:b/ *noun*
(نافەرمی، ئەوستراليا) کەسێکی ئاسایی یا سووک ◌ آدم بیجاذبه یا خوار

**drool** *noun*
لیک، گلێز، گلیز ◌ آب دهان

**droop** /dru:p/ *noun*
داکەوتوویی، شۆڕی، بەربوونەوە، کەوتوویی، چەماوی، داهاتوویی، سستی، داژەندوویی، خۆنەگرتوویی ◌ افتادگی

**droopiness** /'dru:pinəs/ *noun*
داکەوتوویی، شۆڕی، بەربوونەوە، کەوتوویی، چەماوی، داهاتوویی، سستی، داژەندوویی، خۆنەگرتوویی ◌ خمیدگی، افتادگی

**drooping** *adjective*
شۆڕ، هەڵواسراو، بەرەوەبوو، شۆڕەوەبوو، داکەوتوو، کەوتوو، چەمیو، داهاتوو، داژەندوو، خۆنەگرتوو ◌ خمیده، افتاده

**droopy** /'dru:pi/ *adjective* (droopier, droopiest)
شۆڕ، هەڵواسراو، بەرەوەبوو، شۆڕەوەبوو، داکەوتوو، کەوتوو، چەمیو، داهاتوو، داژەندوو، خۆنەگرتوو: *a -py moustache* ◌ خمیده، افتاده

**drop** /drɒp, US dra:p/ *noun*
1 تکە، دڵۆپ، زیپک، تنۆک، تیف، سافان 2 بڕێکی کەم، نەختێ، برێ، چکێ، تۆزقاڵێ 3 (ئارەقخواردنەوە) پیاڵە، گیلاس، لیوانی ئارەقخۆری 4 خواردنەوەی ئارەق 5 شیرینی، نوقڵ، حوبی مژین، شتێ بە شێوەی دڵۆپ (شیرینی، نوقل و هتد) 6 (گوارە و...) پەرەنگ، پڕپڕە 7 داشکان، شکان، کەمبوونەوە، نیشتنەوە، هاتنەخوارەوە، دابەزین، نشوستی، داکەوتن، بەربوونەوە، کەوتنەخوارەوە: *a dramatic/sharp drop in profits* 8 شتێ بەرەوەبوو، کەوتە 9 باربەردانەوە لە حەواوە 10 پەردە 11 درگای تەڵە 12 هەڵدێر، هەڵەت 13 (drops) دەرمانی تکاندن یان دڵۆپاندن 14 (لە سێدارە) ژێرپێ، کون ◌ 1 چکه، قطره 2 ریزه 3 گیلاس 4 مشروبخوری 5 شیرینی، قرص مکیدنی، دراپ 6 آویزه 7 افت، کاهش، سقوط 8 چیز سقوطکرده، پرتاب 9 دراپ 10 پرده 11 در تله 12 پرتگاه 13 (در صورت جمع) داروی چکاندنی 14 (چوبەی دار) دریچه

**drop cloth** = dustsheet

**drop-dead gorgeous** *adjective*
(یەکجار) سەرنجڕاکێش ◌ جذاب

**drop-down menu** *noun*
لیستێ لەو بژارانە کە بە داگرتنی کلیکێ لەسەر پەردەی کامپیوتێرەکە دەردەکەوێ، هەڵبژێرەی بەرەوەبوو ◌ دراپداون منو

**drop-hammer** *noun,* also drop-forge
کوتکی بەرەوەبوو، کوتک یا پوتکی خۆکارکردوو ◌ پتک خودکار

**drophead** *noun*
(بریتانیا) ماشێنی convertible ◌ اتومبیل کروکی

**droplet** /'drɒplət, US 'dra:p-/ *noun*
دڵۆپی ورد، وردەتنۆک، وردەدڵۆپ، تکەی چکۆلانە، تکە، دلۆپ ◌ قطرەی کوچک، چکه

**droplight** *noun*
چرا یا گڵۆپی پەتکی، چرایێ کە بە پەتێکەوە هەڵواسراوە ◌ لامپ آویزی

**drop-off** *noun*
کەمبوونەوە، داشکان، هاتنەخوارێ، داچوون، داکەوتن ◌ کاهش، تنزل

**drop-out** /'drɒpaʊt, US 'dra:p-/ *noun*
1 (خوێندکار) خوێندنبەجێهێشتوو، دەسهەڵگرتوو لە خوێندن 2 بەرەڵا ◌ 1

ترک‌تحصیلی 2 ولگرد

**dropper** /ˈdrɒpə(r), US ˈdrɑːp-/ *noun*
دلۆپێن، دلۆپێنەر ◌ قطره‌چکان

**droppings** /ˈdrɒpɪŋz, US ˈdrɑːp-/ *noun, pl.*
1 جیقنە، ریقنە، زیرچ، چیرت، ریتق، پشقەڵ، شـــیاکە، تـــەرس، تەرســـەقول، ریـــخ 2 گەن‌وگوو(ژاڵ) ◌ 1 فضله، پشکل 2 فضولات

**dropping-tube** *noun*
دلۆپێنەر ◌ قطره‌چکان

**drop-press** = drop-hammer

**drop-scene** *noun*
1 پەردەی بەرشانۆ 2 دوایین پەردەی شانۆیێ ◌ 1 پرده جلو صحنه‌ی نمایش 2 آخرنی پرده از نمایش‌نامه‌ای

**dropsical** /ˈdrɒpsɪkl/ *adjective*
1 سەربە ئاوبەند 2 تووشی ئاوبەندهاتوو، ماسیو 3 = swollen ،turgid ◌ 1 وابسته بـه خیـز 2 مبتلا به خیز

**drops** *noun, pl.*
(دەرمان) دلۆپ، تنۆکە ◌ قطره

**dropsy**[1] /ˈdrɒpsi, US ˈdrɑːpsi/ *noun*, also oedema
ئاوبەند، سکەماسێ، زگەماسێ، ئاقزەلێلک، ماس ◌ خیز، ورم

**dropsy**[2] /ˈdrɒpsi, US ˈdrɑːpsi/ *noun*
(نافەرمی، بریتانیا) بەرتیل، دەم‌شیرینی ◌ رشوه

**dropwort** /ˈdrɒpwɜːt/ *noun*
1 جۆرێ رووەکی گیاجار، بە گوڵی سپی و گەڵای برگەبرگەوە [*Filipendula vulgaris*] 2 (water dropwort) زرگێزنۆکی ئاوی، جۆرێ رووەکـــی ژاراوی لــــە تـــیرەی parsley (ئەوروپا) و جۆرەکانی [*Oenanthe crocata*] تر] ◌ 1 نوعی گیاه 2 شوکران آبی

**drosera** /ˈdrɒs(ə)rə/ = sundew

**droshky** /ˈdrɒʃki/ *noun*
عەرەبانـە، کالیـــسکە، درۆشـکە (بنـەڕەت: لـە *drozhki* رووسی) ◌ درشکه

**dross** /drɒs, US drɔːs, drɑːs/ *noun*
1 (تواندنـەوەی کـانزا) کـۆزەر، کـەف، گـوو، خلتەوخاڵ، تلتە، قرپۆک، خلتە، پەگر، بارەکەف 2 گـەن‌وگـوو، بـازاڕی، خـلتەوخاڵ، ئاشـاخە، گەن‌وگووژاڵ ◌ 1 ریم 2 آشغال

**drought** /draʊt/ *noun*
1 وشکەسالی، سیاسالی، وشکانی، بێبارانی، بێ‌ئاوی، قاقڕی: *two years of severe -rought* 2 (کۆن) توونیەتی ◌ 1 خشکسالی 2 تشنگی

**droughty** *adjective*
بێباران، وشک، قاقڕ، بێ‌ئاو ◌ کم‌آب

**drove**[1] /drəʊv, US droʊv/ = past of drive

**drove**[2] /drəʊv, US droʊv/ *noun*
1 ران، مێگەڵ، کەرک، رەوە، رەقە 2 کۆمەڵ، حەشـیمەت، جەماعـەت، دەسـتە ◌ 1 گلـه 2 جماعت، گروه

**drover** /ˈdrəʊvə(r), US ˈdroʊv-/ *noun*
شوان، رەوەوان، گاوان، مێگەلەوان، چۆدار ◌ چوپان، گله‌دار

**drove rosd** *noun*
مێگەلەڕێ، رانەڕێ، رەوەڕێ ◌ راه گله

**droves** *noun, pl.*
دەستە، تاقم، گروپ، جەماعەت، لەشکر، خێڵ، کۆمەڵ، لێشاو ◌ جماعت، گروه

**drowse** /draʊz/ *noun*
وەنەوز، خەوبردنەوە، سەرخەو، خەوەنووچکە، بیرەخەو، خەواڵوویی ◌ چرت، خواب‌آلودگی

**drowsy** /ˈdraʊzi/ *adjective* (drowsier, drowsiest)
1 خەواڵوو، چاوبەخەو، بەوەنەوز، چاوگەرم‌بوو 2 خەوێنەر، خەوپێوەبوو 3 (خوازە) لەش‌گران، تەمەڵ، تـەوەزەل drowsily /-əli/ *adv*: خەواڵووانە؛ drowsiness *n*: 1 چاوبەخەوبوون، خەواڵـــوویی، خەوبردنـــەوە 2 داگـــیراوی، داهێزراوی) ◌ 1 خواب‌آلود 2 خواب‌آور 3 تنبل

**drubbing** /ˈdrʌbɪŋ/ *noun*
تێ‌شکانی بەتەواوەتی ◌ شکست کامل

**drudge** /drʌdʒ/ *noun*
کولـەمەرگ، زەحمـەت‌کـێش، رەنـج‌کـێش ◌ جان‌کن، خرحمال

**drudgery** /ˈdrʌdʒəri/ *noun, pl.* drudgeries
کولـەمەرگی، چنگەکرێ، کـوێرەوەری، کـاری گیان‌کێش، رەن(ج)کێشی، زەحمەت‌کێشی ◌ جان‌کنی، خرحمالی

**drug** /drʌg/ *noun*
1 دەرمـان، دەوا: *drug* ◊ *prescribed drugs* 2 بـەنگ، مـادەی سـڕکەر، مـادەی هۆش‌بـەر یـان بێهۆش‌کـەر: *drug and companies* (drugs) *alcohol abuse* 3 داوودەرمـان (خوازە) فێربوون، گیرۆدەیی ◌ 1 دارو 2 ماده‌ی مخدر 3 (مجازی) اعتیاد

**drug addict** *noun*
گـیرۆدە، ئـالوودە، بـەنگ‌کـێش (بـە بـەنگ) ◌ معتاد، عملی

**drug addiction** *noun*
گیرۆدەیی، ئالوودەیی، بەنگ‌کێشی ◌ اعتیاد

**drug dealer** *noun*, also drug pusher
بەنگ‌فرۆش (بە شێوەی ناقانوونی)، بڵاوکەرەوەی بەنگ، قاچاخچی ◌ فروشنده‌ی مواد مخدر

**drugget** /ˈdrʌgɪt/ *noun*
بەڕە، زیلۆ، کوتاڵ یان پارچەیی موویی ◌ گلیم، پارچه‌ی زمخت

**druggery** /ˈdrʌgəri/ *noun*
دەواودەرمان، داوودەرمان ◌ داروجات

**druggist** /ˈdrʌgɪst/ *noun*

1 دەرمانساز، دەرمانگرەوە 2 دەرمانخانە ◌ 1 داروساز 2 داروخانە

**druggy** /'drʌgi/ *adjective* (druggier, druggiest), *noun, pl.* druggies

گیرۆدە، بەنگکێش ◌ معتاد

**drugstore** /'drʌgstɔ:(r)/ *noun*

دەرمانخانە، دەواخانە، ئەجزاخانە ◌ داروخانە

**Druid** /'dru:ɪd/ *noun*

درۆئید: قەشەی دینی سێلتی کۆن یا ئەندامی کۆمەڵی دێرینی قەشەکان، لە بریتانیا، ئیرلەند و فەرەنسە، بەرلە دینی کریستیانیەت. ئەم دینە لە لایەن رۆمیی‌یەکانەوە لە فەرەنسە و بریتانیادا تیابرا بەلام لە سکاتلەند و ئیرلەند تا سەرهەڵدانی کریستیانیەت درێژەی پێدرا، جاروبار ڕێورەسمی دینییان لە ستونهێنج Stonehenge بەڕێوەدەبەن ◌ درونید

**Druidic** *adjective*

سەربە Druid ◌ وابستە بە Druid

**Druidism** *noun*

درۆئیدیزم، درۆئیدباوەری ◌ درونیدیسم

**drum**[1] /drʌm/ *noun*

1 دەهۆڵ، گەبرگە (گەورە)، تولوم، تەپڵ، دمەک، دومەڵەک (چکۆلە): 2 *a regular drum beat* دەنگی دەهۆڵ 3 دەهۆڵکوت 4 بەرمیل، کۆس، لولەک: 5 *a 50 gallon drum* (تویکاری) پەردەی گوێ 6 (مێژوویی) دەهۆڵژەنی سەربازی 7 (بیناسازی) دیواری ئەستوونی خڕ کە گومەز رادەگرێ 8 (ئافەرمی. ئەوسترالیا) قەحبەخانە 9 (وەستێنەی ماشین) کاسە، تەپڵ 10 مەنجەڵ (دەزگای جلشتن) 11 (نافەرمی، بریتانیا) خانوو، ماڵ ◌ 1 کوس، طبل، تبک 2 درام 3 طبال 4 بشکە، استوانە 5 پردەی گوش 6 طبال نظامی 7 درام 8 فاحشەخانە 9 کاسەی ترمز 10 مخزن 11 خانە

**drum**[2] /drʌm/ *noun, pl.* same or drums

ماسی‌یەدمە (چونکو دمەی دێ)، ماسی کەناران و ڕێژگاوان [خێزان Sciaenidae: زۆر جۆرن]) ◌ نوعی ماهی

**drumbeat** /'drʌmbi:t/ *noun*

دەنگی تەپڵ یان دەهۆڵ، دمە ◌ صدای طبل

**drumbeater** *noun*

تەپڵژەن، دەهۆڵکوت ◌ طبال

**drum brake** *noun*

(میکانیک) وەستێنەی دەهۆڵی یا تەپڵی یا کاسەیی ◌ ترمز کاسەای

**drumfire** *noun*

تۆپبارانی قورس یان خەست ◌ آتش سنگین توپخانە

**drumhead** /drʌmhəd/ *noun*

1 پێستی تەپڵ، چەرمی دەهۆڵ 2 دادگایی کورت ◌ 1 پوست طبل 2 محاکمەی مختصر

**drumhead court-martial** *noun*

دادگای سەربازی (یان میلیتاری)، دادگای بە درێژایی کرداری سەربازی ◌ محاکمەی صحرایی

**drum kit** *noun*

کۆمەڵی تەپڵ و دەهۆڵ، تەپلان، دەهۆڵبەند، تەپڵبەند (لە سازبەندی) ◌ مجموعەی طبل‌ها

**drum machine** *noun*

دەزگای تەپلی یان دەهۆلی ◌ ماشین طبلی

**drum major** *noun*

1 ڕیبەری مارش یان دەستەی موزیکی سەربازی، ڕیبەری دەستەی موسیقاژەنانی سانبین 2 ڕیبەری تیپی موسیقای گەڕیدە ◌ 1 رهبر مارش 2 رهبر دستەی موزیک خیابانی

**drum majorette** *noun*

(تیپی موسیقای گەڕیدە) کچەپێشەنگ: ئەندامی ئەو باندە ◌ دختر پیشاهنگ

**drummer** /'drʌmə(r)/ *noun*

1 تەپڵژەن، دەهۆڵژەن، دەهۆڵکوت 2 (ئافەرمی، بریتانیا) چەتە، دز ◌ 1 طبال 2 (عامیانە) دزد

**drumming** /'drʌmɪŋ/ *noun*

دیندەڵەدیندەڵ، زرموکوت، خرمەخرم، دەنگی بەردەوامی دەهۆڵ یان تەپڵ: *the steady -ing of the rain on the tin roof* ◌ صدای ضربات

**drum roll** *noun*

دیندەڵەدیندەڵ (ب.ت. بۆ دانەزانینی ڕووداویکی گرنگ) ◌ ضربات مداوم

**drumstick** /'drʌmstɪk/ *noun*

1 داری تەپڵ یان دەهۆڵ، دەهۆڵکوت 2 لاقی مریشک: *a chicken/turkey drumstick* ◌ 1 چوب طبل 2 پای مرغ

**drunk**[1] /drʌŋk/ = past participle of drink

**drunk**[2] /drʌŋk/ *adjective, noun*

*adj* مەست، کەیل، کەڵەلا، سەرگران، سەرخۆش، شاگەشکە، سەرمەست *n* مرۆی مەست ◌ *adj* مست، مسرور *n* آدم مست

**drunkard** /'drʌŋkəd, US -ərd/ *noun*

بادەنۆش، مەیخۆرەوە، هەمیشەمەست، ئارەقخۆر، ئەلکوڵی، alcoholic ◌ بادەگسار، الکلی

**drunk drive** *noun*

شۆفیری مەست ◌ رانندەی مست

**drunken** /'drʌŋkən/ *adjective*

1 مەست، کەلەلا، کەیل، ئارەقخۆر، ئەلکوڵی: 2 لەبەر مەستی *a drunken driver* ◌ 1 مست، الکلی 2 ناشی از مستی

**drunkenly** /'drʌŋkənli/ *adverb*

مەستانە، بە مەستی‌یەوە، لە رووی مەستی‌یەوە ◌ از روی مستی

**drunkenness** /'drʌŋkənnəs/ *noun*

بادەنۆشی، مەیخۆری، ئارەقخواردنەوە،

ئارەق‌خۆری، بادەخۆری ○ بادەگـــاری

**drunkometer** = Breathalyzer

**drupaceous** /dtu:'peɪʃəs/ *adjective*

(رووەکناسی) هەلووژەیی ○ شفتی

**drupe** /dru:p/ *noun*

1 (میوە) میوەی هەلووژەیی، درووپ، شـەفت 2 جۆرێ لەش‌نەرمی دەریایی چکۆلە بە قاوغێکی ئەستووری گرێ‌گرێ یان قۆرت‌قۆرت [توخم *Drupa*] ○ 1 شفت 2 نوعی نرم‌تن

**drupel** /'dru:p(ə)l/ *noun,* also drupelet

(رووەکناسـی) میوەی هەلووژەیی، هەلووژە ○ آلوچە

**druther** /'drʌðə/ *adverb*

تا ئەندازەیێ، تا رادەیێ، کەم تا زۆر ○ نسبتاً

**Druze** /dru:z/ *noun,* also Druse, *pl.* same, Druzes, or Druses

1 درووز (ئەنـدامی تیرەیـەکی سیاسـی و دیـنی ئیسلامی، زۆریەیان لە لوبنان و سووریا دەژین 2 لە ناوی Muhammad ibn Ismail *al-Darazī* هەلگیراوەتەوە) ○ دروز

**dry** /draɪ/ *adjective* (drier, driest)

1 وشـک، تـورت، کـزر، کـوێر (کـانی)، زەهـا 2 کـەم‌باران، بـێ‌ئـاو، وشـک 3 (مانگـا) بـێ‌شـیر، وشـک‌کردوو، بێ‌دەم‌ودۆ 4 (نان) بێ‌کەرە، وشـک 5 رەق، وشکەوەبوو، رەقـەوەبوو 6 (خواردنـەوە) تـــاڵ، شـــیرین نییـــە، مـــزر 7 تینـــوو، تهـــنی، تینوێتی‌هێنەر، تینووتی دێنێ 8 ناخۆش، وشـک، ماندووکەر، وەڕەزکەر 9 سارد، وشک، ساردوسـڕ 10 ئاشـــکرا، دیـــار، بـــەرچاو ○ 1 خـــشـک 2 کم‌باران، بی‌آب 3 (گاو) بی‌شیر 4 (نان) بـدون کـره 5 سفت 6 (مشروب) تلـخ 7 تـشنە. تـشنگی‌آور 8 ملال‌آور 9 سرد 10 صریح، محض

**dryad** /'draɪæd/ *noun*

1 (لە چیرۆکی یۆنانی‌یەکان‌دا) پەری دارستان 2 جۆرێ پەپوولەی قاوەیی تۆخ [*Minois dryas*] ○ 1 پری جنگلی 2 نوعی پروانە

**dryas** /'drʌɪəs/ *noun*

1 رووەکـــی تیرەیـــێ کـــە avens ی کێـــوی لـــەخۆدەگرێ [تـــوخم *Dryas*] 2 (Dryas زەوی‌ناســـی) قۆنـاخێکی ســـاردە لـە کۆتـایی سـەردەمی سەهۆڵبەندان لە باکووری ئەورووپا ○ درایس

**dry battery** *noun*

باتری وشک، وشکەباتری ○ باتری خشک

**dry-cleaner's** = cleaner

**dry-cleaning** *noun*

شوێنی شتنی جل و پارچە بە مەتریاڵی کیمیایی هەتا ئاو، وشکەشۆری ○ خشک‌شویی

**dry cough** *noun*

کۆخەی وشک، وشکەکۆخە ○ سرفەی خشک

**dry distillation** *noun*

دلۆپاندنی وشک، وشکەدلۆپاندن ○ تقطیر خشک

**dry dock** *noun*

(بۆ کاردن یان چاک‌کردنەوەی بنەوەی کەشتی) گۆلاوی وشک، گۆمی وشک، حەوزی وشک ○ حوض خشک

**dryer** /'draɪə(r)/ *noun,* also drier

1 مەتریالـــی وشـــک‌کـــەرەوە 2 دەزگـــای وشک‌کردنەوە 3 (لە لێکدانا) ـوشک‌کەرەوە، ـوشکێن ○ 1 مـادەی خـشک‌کننـدە 2 ماشـین خشک‌کنندە 3 ـخشک‌کن

**dry-eyed** *adjective*

1 بێ‌گریان، بێ‌فرمێـــسک، چاووشـک، نەگریاو 2 بێ‌هەسـت، وشـک، سـارد ○ 1 بـدون گریـە 2 بی‌احساس

**dry farming** *noun*

دێمەکاری، دێم‌کاری ○ دیم‌کاری

**dry gangrene** *noun*

وشکەلاڕەشـە، لاڕەشـەی وشـک ○ قانقاریـای خشک

**dry goods** *noun, pl.*

1 پارچە، کوتاڵ 2 کەل‌وپەلی وشک، وشکەبار (وەکوو چای، قاوە و هتد) ○ 1 منـسوجات 2 وسایل خشک

**dry ice** *noun*

سەهۆلی وشک، وشکەسەهۆڵ ○ یخ خشک

**dryish** *adjective*

کەمێ وشک ○ نسبتاً خشک

**dry land** *noun*

وشکانی، وشکایی، بەژ، وشکار ○ خشکی

**dry law** *noun*

(لەئـەمریکا) قـانوونی وشـک (بـۆ فرۆشـتنی خواردنەوەی ئەلکۆلی) ○ قانون خشک

**dryly** /'draɪli/ *adjective*

ساردوسڕانە، وشکانە ○ با سردی

**dry measure** *noun*

پێوانە یان کێشانەی وشکەمەنی (دانەوێلە و...) ○ مقیاس خشک‌بار

**dry milk** *noun*

(ئەمریکا) شیری وشک ○ شیر خشک

**dryness** /draɪnəs/ *noun*

1 وشـکی، زوهـایی 2 کـەم‌بـارانی، بـێ‌بـارانی، بێ‌ئاوی 3 ساردوسڕی، وشکی، کەمتەرخەمی، گوێ‌پێ‌نەدان ○ 1 خشکی 2 کم‌بارانی 3 بی‌تفاوتی

**dry nurse** /'draɪnɜ:s/ *noun*

لەلە، دایەن (شیر نادا بە منالان) ○ للـه

**Dryopithecus** /ˌdrʌɪə'pɪθɪkəs/ *noun*

مەیموونەدارینـــــە: تیرەیێکـــــی مەیموونـــــە جومگـــەدارەکانی نێوەڕاســـتی قۆناخـــەکانی Miocene و سەرەتای Pliocene کە وادادەنرێ کـە gorilla، chimpanzee و مـرۆڤ لـەوەوە داکەوتبێتن ○ نوعی میمون

**dry rot** /ˌdraɪˈrɒt/ *noun*
1 رزینی دار، پووانی دار، دافەوتانی دار، خورانەوەی دار، کەڕوو یان فونگۆسی رزینەری دار، رزینەی دار، رەگەوشکە 2 (خوازە) فەوتانی بەرەبەرە، دارزانی لەبەرەوە (ب.ت. ریکخراوە یا ستانداردە ئاکارییەکان) ۞ 1 پوسیدگی چوب، قارچ پوسندەی چوب 2 (مجازی) فساد تدریجی

**dry run** *noun*
(نافەرمی) مەشق، کارکردن، دەورکردنەوە، پیاچوونەوە (ب.ت. بۆ ئاهەنگێ) ۞ تمرین

**dry-salter** *adjective*
1 (مێژوویی، بریتانیا) رەنگفرۆش، دەرمانفرۆش 2 قاوورمەفرۆش ۞ 1 رنگفروش 2 درای‌استالر

**dry-shod** /ˈdraɪʃɒd/ *adjective*
بە پێی وشکەوە، بە کەوشی وشکەوە ۞ با پای خشک

**dry slope** *noun*, also dry-ski slope
تەلان یان لێژایی دەسکرد بۆ سکی ۞ سرازیری مصنوعی برای اسکی

**drystone** /ˈdraɪstəʊn/ *noun*
وشکەچن، بێمالات، خەرە، قسن ۞ خشکەچین

**drystone wall** /ˌdraɪstəʊn ˈwɔːl, US -stoʊn/ *noun*
دیواری وشکەچن، وشکەدیوار، دیواری بێمالات، خەرە، وشکدیس ۞ دیوار خشکەچینی

**dry valley** *noun*
وشکەدەرە، وشکەدۆل، شیوەوشکە ۞ درەی خشک

**drywall** = plasterboard

**Dsc** *abbreviation* Doctor of Science
دوکتۆرای زانست ۞ دکترای علم

**DSL** *abbreviation* digital subscriber line
هێلی هاوبەشی ژمارەیی یان دیجیتال (هێلێ تەلەفونی کە دەزگایەکی تایبەتی هەیە کە ریگە دەدا لە ئینتێرنێت زانیاری وەرگرێ، یان زانیاری بە خێراییەکی یەکجار زۆر بنێرێ) ۞ دی‌اس‌ال

**DTI** *abbreviation* Department of Trade and Industry
(لە بریتانیا) دی‌تی‌ئای (شالیاری یان وەزارەتی بازرگانی و پیشەسازی) ۞ دی‌تی‌آی

**DTP** *abbreviation* desktop publishing

**DTs** *abbreviation* delirium tremens
جۆرێ تێکچوونی دەروونی ۞ نوعی آشفتگی روانی

**dual**[1] /ˈdjuːəl, US ˈduːəl/ *adjective*
1 دووانە، دوانە، دوانی، جووت، دووانی 2 دوولایەنە، دووسەرە، دوولایی، دووقۆلی، دووبەری 3 دووکەسە 4 (لە لێکدانا) دوو...ە، جووت...ە ۞ 1 دوگانە 2 دوسویە، دوجانبە 3 دونفرە 4 (در ترکیب) دو...

**dual**[2] /ˈdjuːəl, US ˈduːəl/ *noun*
(ڕێزمان) دوانە، جووت ۞ تثنیە

**dual-band** *noun*
دووباندە (موبایلێ کە بەلای کەمەوە دەتوانێ لە دوو ولاتی جیاواز کاربکا، چونکو دەتوانێ دوو جۆر سیگنالی جیاواز وەرگرێ) ۞ دوباندە

**dual carriageway** *noun*, also divided highway
پانەڕێ، گەورەڕێ ۞ بزرگراه

**dual-control** *adjective*
(ماشێن و هتد) بە مەهار یان کۆنترۆلی دوولایەنەوە ۞ با مهار دوسویە

**dual-control car** *noun*
ماشێنی بە کۆنترۆلی دوولایەنە یا دوولامەهار ۞ ماشین با مهار دوسویە

**dualism** /ˈdjuːəlɪzəm, US ˈduː-/ *noun*
دوانەگەری، دوانەباوەری، دوانەپەرستی (وەک چاکە و خراپە یان زەین و مادە) ۞ ثنویت

**dualist** /ˈdjuːəlɪst, US ˈduː-/ *noun*
دوانەگەر، دوانەباوەر، دوانەپەرست ۞ ثنوی

**dualistic** *adjective*
دوانەباوەڕییانە، سەربە دوانەپەرستی ۞ دوئالیستی (dualistically *adv*)

**duality** /djuːˈæləti, US duː-/ *noun, pl.* dualities
دوویێتی، دوانەیەتی، دووبەرایەتی ۞ دوگانگی

**dual-purpose** *adjective*
دووکارە، جووتکارە، دوومەبەستە: *The church is a modern dual-purpose building, both a place of worship and a* *a dual-purpose ◊ community centre vehicle* ۞ دومنظورە

**dual-use** *adjective*
(ئەمریکا، تێکنۆلۆژی یان دەزگایێ) دووکارە ۞ دومنظورە

**dub**[1] /dʌb/ *noun*
داب: شێوازێکی هەلبەست یان موسیقای سوورپێستەکان بە ترپەی رێکوپێک و توندەوە ۞ داب

**dub**[2] /dʌb/ *noun*
کەسێکی بێئەزموون یان ناشارەزا ۞ آدم ناشی یا بی‌تجربە

**dubbed film** *noun*
فیلمی وەرگێردراو یا دووبلەکراو ۞ فیلم دوبلەشدە

**dubber** *noun*
دووبلێنەر، دووبلەچی، دووبلەکار ۞ دوبلەکنندە

**dubbin** /ˈdʌbɪn/ *noun*
رۆنی چەرم، گریسی چەرم، بۆیاخی چەرم ۞ واکس چرم

**dubbing** *noun*
دووبلاژ، وەرگێران ۞ دوبلاژ

**dubiety** /ˌdjuːˈbaɪəti, US ˌduː-/ *noun*, aslo dubiosity, *pl.* dubieties
1 گومـان، دوودڵـی، دڕدۆنگـی، شـک 2 شـتی گومان‌لێ‌کراو یان جێی‌شک ۞ 1 تردید، دودلـی 2 اسباب تردید

**dubious** /ˈdjuːbiəs, US ˈduː-/ *adjective*
1 گومـان‌بـار، گومـان‌لـێ‌کـراو، گومانـاوی، جێی‌شک، گومان‌لەسەر، لێ‌ڕانەبینراو، دوودڵ، دڕدۆنـگ، بەشـک، لـێڵ، تـەماوی، نـاڕوون، نامـەعلووم، نادیار: *I was rather dubious about the whole idea* (خـوازە) سـست، لـێ‌ڕانـەبینراو، باوەڕپـێ‌نـەکراو، نادڵـنیا ۞ 1 مشکوک، مردد، نامعلوم 2 (مجازی) غیرقابل اعتماد

**dubiously** /ˈdjuːbiəsli, US ˈduː-/ *adverb*
بە گومانەوە، بە شێوەیێکی گومان‌لێ‌کراو ۞ با تردید، به طور مشکوک

**dubiousness** /ˈdjuːbiəsnəs, US ˈduː-/ *noun*
گومـان‌لـێ‌کـراوی، جێـی‌شـک‌بـوون، گومـان لەسەربوون ۞ مشکوکیت

**dubitability** /ˌdjuːbɪtəˈbɪləti/ *noun*
گومـان‌بـاری، گومـان‌لـێ‌کـراوی، گومانـاویی، جێی‌شک‌بوون، جێی‌گومان‌بوون، گومان‌لەسەری ۞ مشکوکیت

**dubitable** /ˈdjuːbɪtəb(ə)l/ *adjective*
گومان‌بار، گومان‌لێ‌کراو، گوماناوی، جێی‌شک، گومان‌لەسەر ۞ مشکوک

**dubitation** /ˌdjuːbɪˈteɪʃ(ə)n/ *noun*
گومان، شک، دوودڵی، دڕدۆنگی ۞ شک، تردید

**Dublin Bay prawn** = Norway lobster; Dublin Bay prawns = scampi

**dubnium** /ˈdʌbnɪəm/ *noun*
دابنیۆم، دۆبنیۆم (بە ژ.گ. 105، ن. Db: لاتینی نوێ، لە *Dubna* شارێکی ڕووسیە، ناوەندێ بۆ لێکۆڵینەوەی توخمە قورسەکان) ۞ دوبنیم

**Dubonnet** /d(j)uːˈbɒneɪ/ *noun*
(دروشمـی بازرگـانی) جـۆرێ مـەی شـیرینی سـووری فەرەنسی ۞ دوبونت

**ducal** /ˈdjuːkl, US ˈduːkl/ *adjective*
سەربە دوک duke ۞ وابسته به دوک

**ducat** /ˈdʌkət/ *noun*
1 داکیت، دوکات (کۆینێکی زێڕین کە جاران لە هێندێ وڵاتی ئەوروپایی بەکاردێنرا) 2 (نافەرمی) پارە 3 (نافەرمی، ئەمریکا) بلیت، تیکێت ۞ 1 دوکات 2 (عامیانه) پول 3 (عامیانه) بلیط

**Duchenne mascular dystrophy** /duːˈʃɛn/ *noun*
پووکانـەوەی ماسـوولکەیـی دوشـێن: جـۆرێ پووکانـەوەی سـەختی ماسـوولکەیی (بڕوانـە Becker muscular dystrophy؛ بنـەڕەت: لـە ناوی دەمارناسـی فـەڕەنسـی .G. B. A *Duchenne*) ۞ تحلیل یا پلاسیدگی ماهیچەای دوشن

**duchess** /ˈdʌtʃəs/ *noun*
1 داچیس، دوشیس، ژنی دوک: *the Duchess of York* 2 ژنێ کە پلە و پایەی duke هەیە ۞ دوشس

**duchesse** /duːˈʃɛs, ˈdʌtʃɪs, -ɛs/ *noun*
1 (هەروەها duchesse satin) جۆرێ ساتینی نـەرم، قـورس و ورشـن 2 میـزی ئاوێنـەداری سووڕاو ۞ دشس

**duchy** /ˈdʌtʃi/ *noun, pl.* duchiés
دوک‌نشین، ناوچـەی ژێردەسـەڵاتی دوک یـان دوشێس ۞ دوک‌نشین

**duck**[1] /dʌk/ *noun, pl.* same or ducks
1 مـراوی [خێـزان Anatidae: زۆر جـۆرن] 2 بۆرچین، مراوی مێ (بڕوانە drake[1]) 3 گۆشتی مـراوی 4 (لـە بانـگ‌کـردن، ب.ت. ژن) خۆشەویستەکەم، نازیزەکەم 5 جۆرێ لەش‌نەرمی دوولەپکەی قاوغ‌ناسک [توخم *Anatina*] ۞ 1 اردک، مرغابی 2 اردک ماده 3 گوشت مرغابی 4 (در خطاب) عزیزم 5 نوعی نرم‌تن

**duck**[2] /dʌk/ *noun*
1 پارچەی کەتانی (قایم کە بۆ جلی کار یان بـادەوەی کـەشـتی بـەکـاردێنرێ) 2 (ducks) شەڵواری ئەو پارچەیە ۞ داک

**duckbill** *noun*, also platypus
(گیانەوەرناسی) دەنووک‌مراوی، پلاتیپۆس ۞ پلاتیپوس

**duck-billed dinosaur** = hadrosaur

**duck-billed platypus** = platypus

**duckboards** /ˈdʌkbɔːdz, US -bɔːrdz/ *noun, pl.*
ڕێگای تەختەیی، تەختەڕێ ۞ داکبوردز

**ducking** *noun*
(مەلە) خووساندن، لەئاو هەڵکێشان ۞ آب دادن

**duckling** /ˈdʌklɪŋ/ *noun*
جوجکەمراوی، بەچکەمراوی، بێچووە بۆرچین ۞ جوجەی مرغابی

**duckmeat** /ˈdʌkmiːt/ = duckweed

**duck mussel** *noun*
جـۆرێ mussel ئـاوی شـیرین [ *Anodonta anatina*] ۞ داک ماسل

**duckpins** *noun*
داکپینز: جۆرێ یاری لە بولینگ دەچێ ۞ داک‌پینز

**ducks** *noun*
شەڵواری کەتانی ۞ شلوار کتانی

**ducks and drakes** *noun*
ماساو، قارقارێن، تیکلە، بەردەبازێ ۞ لیسەپرانی

**duck soup** *noun*
(نافەرمی، ئەمریکا) کاری ئاسان ۞ کار ساده

**ducktail** *noun*

کلک‌مراوی: جۆری شیوازی (داهێنانی) قژی سەر ◌ داک‌تایل

**duckweed** /'dʌkwi:d/ *noun*
قەوزە، کەفزە [*Lemna* و توخمەکانی تر، خێزان Lemnaceae] ◌ خزه

**ducky** /'dʌki/ *noun* (*pl.* duckies), *adjective*
(نافەرمی، بریتانیا) *n* خۆشەویست، ئازیز (لە بانگ‌کردنا) *adj* خۆش، بەلەزەت ◌ *n* عزیزم *adj* مطبوع

**duct** /dʌkt/ *noun*
1 (تویکاری) جۆگە، کانال، رەگ: *the bile duct* 2 (رووەک) ئاوخورە، رەگ، رەگاو 3 رەهەند 4 لوولە، بۆری، هەواکێش: *a heating/ventilation duct* ◌ 1 مجرا 2 آوند 3 کانال 4 لوله

**ductile** /'dʌktaɪl/ *adjective*
1 (کانزا) کوتراو، نەرم، بەلوولەکراو، لەلوولەهاتوو، لەکوتان‌هاتوو: *ductile iron* 2 نەرم (بێ ئەوەی گەرمی پێبگەبێنرێ) 3 (مرۆڤ) (بە ئاسانی) کارلێ‌کراو، دەستەمۆ، ژێربارهاتوو، نەرم ◌ 1 چکش‌خوار، مفتول‌شونده 2 انعطاف‌پذیر 3 (آدم) تأثیرپذیر

**ductility** /dʌk'tɪləti/ *noun*
کوتراوی، بەلوولەکراوی، لەلوولەهاتوویی، نەرمی، لەکوتان‌هاتوویی، لەپیاکێشان‌هاتوویی ◌ چکش‌خواری، مفتول‌شوندگی

**ducting** /'dʌktɪŋ/ *noun*
1 (تویکاری) دەزگای جۆگە یا کانالەکان، جۆگەمەنی، دەزگا یان سیستمی رەگەکان 2 ماک و مەتریالی پێکهێنەری داکتەکان: *a short piece of -cting* ◌ 1 سیستم مجاری 2 داکتینگ

**ductless** *adjective*
(تویکاری) ئاماژە بە رژێنەیێ کە راستەوخۆ هۆرمۆن و هتد دەرژێنێتە نێو خوێن (وەک endocrine gland) ◌ درون‌ریز

**ductless gland** *noun*, also endocrine gland
رژێنەبێ‌لوولە، رژێنە یا لووی داخراو، لووەکوێرە، رژێنەیێ کە راستەوخۆ هۆرمۆن و هتد دەرژێنێتە نێو خوێن، نێوەرژێن ◌ غده‌ی درون‌ریز

**ductular** *adjective*
(تویکاری) سەربە جۆگە یان کانالی بچوک، رەگۆچکەیی ◌ وابسته به مجرای کوچک

**ductule** /'dʌktju:l/ *noun*
(تویکاری) جۆگە یان کانالی بچووک، رەگۆچکە ◌ مجرای کوچک

**ductus** /'dʌktəs/ *noun*, *pl.* ducti
(تویکاری) جۆگە، کانال، رەگ ◌ مجرا

**dud** /dʌd/ *adjective*, *noun*
*adj* 1 بەکارنەهاتوو، بێ‌سوود، بێ‌قازانج، بێ‌بەهرە، بێکارە، بێ‌خێرە، خراپ: *a dud battery ◊ dud checks* 2 (بۆمب و هتد) نەتەقیو *n* 1 مرۆی بەکارهیچ‌نەهاتوو، بێکارە، بێ‌خێرە 2 شتی بەکارنەهاتوو ◌ *adj* 1 بی‌مصرف، بی‌فایده، بد 2 منفجرنشده *n* 1 آدم بی‌خاصیت 2 چیز بی‌مصرف

**dud cheque** *noun*
چەکی بەکارنەهاتوو یان بێ‌خێرە؟، چەکی تیانەبوو، چەکی وردەونەبوو ◌ چک بی‌محل

**dude** /du:d, US dju:d/ *noun*
1 (نافەرمی) کابرا 2 تەرپۆش ◌ 1 (عامیانه) آدم 2 ژیگولو

**dude ranch** *noun*
(لە ئەمریکا) مووچەی رابواردن، کێو ◌ مزرعه‌ی تفریحی

**dudgeon** /'dʌdʒən/ *noun*, in high dudgeon
(زۆرتر بە شۆخی) داروبەرد هێنانە خوارەوە، بەرد بەبا کردن، بە تووڕەیی‌یەکی تەواوەوە، بە توندی بە گژداچوونەوە ◌ با عصبانیت تمام

**due** /dju:, US du:/ *adjective*, *adverb*, *noun*
*adj* 1 لەدانەوەهاتوو، شیاوی دان یان پێدان 2 وادە، وەختی دانەوە 3 خاوەن‌قەرز 4 دیاری‌کراو، دانراو، بڕیارلەسەردراو، پێویست 5 باش، گونجاو، رەوا، شیاو، حەق، بەرحەق، *giving the matter due attention* :adequate 6 لە ئەنجامی، لەبەر *adv* (لادوز compass) دروست *n* 1 ماف، حەق 2 قەرز 3 (dues) حەقی ئەندامێتی، ئەندامانە 4 حەق ◌ *adj* 1 قابل پرداخت 2 موعد 3 طلبکار 4 معین، لازم 5 مناسب، سزاوار 6 ناشی از *adv* دقیقاً *n* 1 حق 2 بدهی 3 (dues) حق عضویت 4 حقوق

**duel** /'dju:əl, US 'du:əl/ *noun*
1 دوئێل 2 پێشبڕکێ، بەریکانی 3 شەڕ، کێشە، ململانێ، کێشمەکێش، شەڕوکێشە، تێک‌هەڵچوون ◌ 1 دوئل 2 مسابقه 3 مبارزه، درگیری

**duelling** /'dju:əlɪŋ/ *noun*
دوئێلینگ: *duelling pistols* ◌ دوئلینگ

**duellist** *noun*, also duelist or dueler (dueller)
دوئێلیست ◌ دوئل‌کننده

**duende** /du:'endeɪ/ *noun*
1 تین، گوڕ، سۆز 2 رۆح یان گیانی خراپ ◌ 1 شور 2 روح شریر

**duenna** /du:'enə/ *noun*
سەرسپی، پرچ‌سپی (= ژنێکی بەتەمەن لە خێزانی سپانیولی کە ئاگاداری کچان و ژنانە) ◌ دونا

**duet** /dju'et, US du'et/ *noun*
دوئێت (پارچە موسیقایێ بۆ دوو گۆرانی‌بێژ یا دوو موسیقاژەن) ◌ دوئت

**due time** *noun*
وەختی دانراو، کاتی دیاری‌کراو ◌ زمان مقرر

**duff**[1] /dʌf/ *adjective*, *noun*

*adj* بەکارنەهاتوو، بێسوود، لەکارکەوتە، خراپ، بێقازانج، بێکارە، بێخێرە، خراپ، inferior، worthless *n* مەتریالی گیایی رزیو کە تەرکی دارستانی داپۆشیوە ◌ *adj* بی‌مصرف، بە دردنخور *n* داف

**duff²** /dʌf/ *noun*
کنگ، قوون، روونەک، پاشوو، پاشل، سمت ◌ نشیمن، سُرین، ماتحت

**duff³** /dʌf/ *noun*
زگپڕ، سکپڕ، دووگیان، حامیلە ◌ باردار

**duff⁴** = dough

**duffel** /'dʌfl/ *noun*, also duffle
1 جۆرێ پارچەی زبر 2 پێداویستی وەرزشی یا لە چادرامانەوە ◌ دافل

**duffer** /'dʌfə(r)/ *noun*
1 مرۆی گێژ، حەپە، کەرۆکاس، کەر، گەوج، گێل 2 (ئەوسترالیا) کانی بێبەرهەم، زڕەکان (لە بنەڕەتا: کەسێ کە شتی کەمبایی وەکوو شتی چاک و گران دەفرۆشی) ◌ 1 آدم خنگ، احمق 2 معدن بی‌حاصل

**duffle bag** /'dʌfl bæg/ *noun*, also duffel bag /'dʌfl bæg/
جانتای توورەکەیی یان پارچەیی ◌ جامەدان کیسەای

**duffle coat** /'dʌfl bæg/ *noun*, also duffel coat
کەوان یان کۆتی کلاودار (لە duffle دروست دەبێ) ◌ نوعی کت

**dufus** = doofus

**dug¹** /dʌg/ = past and past participle of dig

**dug²** *noun*
1 (گیانەوەران) گوان، گرێژ، سەرگوان، چینچک، سەرتیر، گۆ، گۆپکە 2 (کۆن) مەمکی ژن ◌ 1 پستان، نوک پستان 2 پستان زن

**dugite** /'dju:gʌɪt/ *noun*
مارێکی یەکجارژاراوی باشووری رۆژاوای ئەوسترالیا [*Pseudonaja affinis*] (بنەڕەت: لە Nyungar *dukayj* وەرگیراوە) ◌ نوعی مار

**dugong** /'du:gɒŋ, US 'dju:-/ *noun*, *pl.* same or dugongs
جۆرێ مانگای دەریایی، لە ئۆقیانووسی هێندا دەبینرێ، لە manatee هەڵدەبوێردرێ لەبەر کلکی لۆلقی [*Dugong dugon*] ◌ دوگونگ

**dugout** /'dʌgaʊt/ *noun*
1 گەمی یەکپارچە یا کۆلی، بەلەم یا گەمی کۆلکەیی (نێوی هەلکۆلراێ) 2 (سەربازی) رەهەند، رەهۆل، جێپەنا، پەنا ◌ 1 بلم یک‌تکه 2 جان‌پناه، تونل

**duiker** /'dʌɪkə/ *noun*, *pl.* same or duikers
1 جۆرێ ئاسک یان بزنەکێوی چکۆلەی ئەفریکایی [*Sylvicapra grimmia* و جۆرەکانی تر] 2 (ئەفریکای باشووری، جۆرێ) قەلمراو ◌ 1 نوعی آهو 2 نوعی باکلان

**duke** /dju:k, US du:k/ *noun*
دوک (بنەڕەت: لە *duc* فەرەنسی کۆن، لە *dux*، *duc-* لاتین "رێبەر") ◌ دوک

**dukedom** /'dju:kdəm, US 'du:k-/ *noun*
پۆست یا پلەوپایەی دوک، دوکنشین، ناوچەی ژێردەسەلاتی دوک ◌ مقام دوک، دوک‌نشین

**DUKW** /dʌk/ *noun*
داک: جۆرێ ماشینی وشکاوەکی گواستنەوە، لە شەری جیهانی دووەمدا لە لایەن هاوپەیمانانەوە بەکاردەهێنرا ◌ داک

**dulcamera** /ˌdʌlkə'mɛ:rə/ *noun*
شیرین‌تاڵ (تاوگی رێژەڵەی دارین) ◌ دولکامرا

**dulcet** /'dʌlsɪt/ *adjective*
(دەنگ) خۆش، بەسۆز، شیرین، زوڵاڵ، بلاوێن، گەرم ◌ دلنشین، گرم

**dulcian** /'dʌlsɪən/ *noun*
جۆرێ باسوونی bassoon سەرەتایی یەکپارچە ◌ دولسین

**dulcification** *noun*
شیریناندن، شیرینکردن ◌ شیرین‌سازی

**dulcimer** /'dʌlsɪmə(r)/ *noun*
1 قانوون، دۆلسیمێر (= ئامێرێکی موسیقایی) 2 (هەروەها dulcimore) جۆرێ ئامێری ئەمریکایی سێ یان چوار ژێ، لەسەر کۆش دادەنرێ و لێدەدرێ (بنەڕەت: رەنگە لە *dulce melos* لاتین "ئاوازی شیرین") ◌ دولسیمر

**dulcitone** /'dʌlsɪtəʊn/ *noun*
دۆلسیتۆن (ئامێرێکی موسیقایی) ◌ دولسیتون

**dull** /dʌl/ *adjective* (duller, dullest)
1 مات، لێڵ، کەمڕەنگ، تەلخ، قورس، نابریقەدار: *dull, lifeless* ◊ *a dull grey colour* 2 (دەنگ) گیراو، نووساو، بۆڕ: *Her eyes were dull* ◊ *hair* *The gates shut behind him* *with a dull thud* 3 (هەوا) هەوری، هەورو‌هەلا: *It was a dull, grey day* 4 (ژان) کەم، سووک: *a dull ache/pain* 5 (چەقۆ و هتد) کول، نەبڕ، تەقلار، نەتیژ، بێساو (ب.ت. بۆ داس) 6 گێژ، گێل، کول، گەمژە، زەینکوێر، دەبەنگ، درەنگ‌تێگەیشتوو، بێدەموپل، گەوجانە: *a dull pupil* 7 وەڕەزکەر، دیقبێکەر، ماندووکەر، ناخۆش: *Life in a small town could be deadly dull* ◊ *The countryside was flat, dull and uninteresting* 8 بێبازاڕی، ست، بازاڕکەساس، نەشلوق، خاو 9 بنە، بنزیل، بنبار، ئایەخ، بەشی نەفرۆشراو ◌ 1 تیرە، کدر 2 (صدا) خفە 3 (هوا) ابری 4 (درد) خفیف 5 (چاقو) کند 6 خنگ، کودن، احمقانە 7 کسل‌کنندە 8 کاسد 9 بنجل

**dullard** /'dʌlɑ:d, US -lɑ:rd/ *noun*

دەبەنگ، گەمژە، گێژ، زەین‌کوێر ◇ ابله

**dull-brained** /'dʌlbreɪnd/ *adjective*
دەبەنگ، گەمژە، گێژ، زەین‌کوێر ◇ ابله، کودن

**dull-head** /'dʌlhed/ *adjective*
دەبەنگ، گەمژە، گێژ، زەین‌کوێر ◇ ابله

**dullish** *adjective*
کەمێ تاریک، کەمێ مات یان کەم‌ڕەنگ (dollishly *adv*) ◇ نسبتاً تیره

**dullness** /dʌlnəs/ *noun*
1 کولی، نەتیژی، نەبڕی 2 تەڵخی، لێڵی 3 زەین‌کوێری، درەنگ‌تێگەیشتوویی، دەبەنگی، گێلی 4 بێ‌تاقەتی، سستی، داگیراوی، ناخۆشی، ماندووکەری، وەڕەزکەری 5 بێ‌بازاڕیتی، بێ‌بڕەویتی ◇ 1 کندی 2 تیرگی 3 کندذهنی 4 رخوت، کسل‌کنندگی 5 کساد

**dully** /'dʌlli/ *adverb*
1 کول، بە کولی 2 بە وەڕەزییەوە، بە بێ‌تاقەتییەوە: *'I suppose so,' she said dully* ◇ 1 کند 2 با خستگی

**dulse** /dʌls/ *noun*
قەوزەیێکی سووری تۆخ [*Rhodymenia palmata*] ◇ نوعی جلبک

**duly** /'dju:lɪ US 'du:lɪ/ *adverb*
بە وەختی خۆی، سەری وەخت ◇ به موقع

**duma** /'du:mə/ *noun*, also Duma
(رووسیەی تزاری) ئەنجومەنی قانوون‌دانان ◇ دوما

**dumb** /dʌm/ *adjective*
1 لاڵ 2 (گیانەوەر) بێ‌زمان 3 بێ‌دەنگ، بێ‌قسە، کپ، بێ‌زمان، زمان‌لەدەم‌مانەبوو 4 گێژ، حەپە، گەمژە، زەین‌کوێر، گەوجانە، کەرانە ◇ 1 لال 2 (حیوان) زبان‌بسته 3 خاموش 4 خنگ، احمقانه

**dumb animal** *noun*
گیانەوەری گوناهـ یان جێی بەزەیی ◇ حیوان سزاوار ترحم

**dumbbell** /'dʌmbel/ *noun*, also dumb-bell
1 میل، دەمبیل، دەمبێل 2 (نافەرمی) دەبەنگ، گەوج، کەر، دەبەنگ، حەپۆل ◇ 1 دمبل 2 (عامیانه) الاغ، احمق

**dumb cane** *noun*
جۆرێ گیای لاسک‌ئەستووری کارییەن بە شیلەیێکی ژاراوییەوە کە زمان دەماسێنێ و توانایی قسەکردن لەنێودەبا [*Dieffenbachia seguine*] ◇ نوعی گیاه

**dumbfounded** /dʌm'faʊndɪd/ *adjective*
واق‌وڕماو، سەرسووڕماو، تاساو، حەپەساو، ماقماو، عەبەسراو، زمان‌بەسراو، دەم‌بەسراو ◇ مبهوت

**dumbly** /'dʌmli/ *adverb*
بێ‌دەنگانە، بێ‌ورتەلێ‌هاتن: *'Are you all right?' Laura nodded dumbly* ◇ با سکوت

**dumbness** /'dʌmnəs/ *noun*
1 لالی 2 گێژی، حەپەیی، گەمژەیی، زەین‌کوێری ◇ 1 گنگی 2 کودنی

**dumbo** /'dʌmbəʊ, US -boʊ/ *noun*, *pl.* dumbos
(نافەرمی) کەسێکی حەپۆل یا گەمژە ◇ آدم خنگ

**dumb piano** *noun*
پیانۆی مەشق (بۆ ڕاهاتنی قامکەکان) ◇ نوعی پیانوی تمرینی

**dumb show** /'dʌmʃəʊ, US -ʃoʊ/ *noun*
پانتۆمیم، کپەشانۆ، لاڵبازی ◇ پانتومیم

**dumbstruck** /'dʌmstrʌk/ = dumbfounded

**dumb waiter** /ˌdʌm'weɪtə(r)/ *noun*
1 (خواردنگە، میوانخانە و هتد) خۆراک‌هەڵکێش، ئاسانسۆری خۆراک (و قاپ‌وکەوچک، لە نهۆمێکەوە بۆ نهۆمێکی‌تر) 2 میزی سووڕاو یان جوولاو، میزی گەڕۆک ◇ 1 آسانسور غذا 2 میز گردان

**dumdum** /'dʌmdʌm/ *noun*, also dumdum bullet
گوللە یان تیری دام‌دام (بنەڕەت: لە *Dum Dum* ناوی شار یان جبەخانەیێ نزیک بە Calcutta ی هیندوستان، جێگایێ کە یەکەم جار لەوێ بەرهەم هات) ◇ دام‌دام

**dum-dum** *noun*
(نافەرمی) کەسێکی گەوج ◇ آدم احمق

**dumdum bullet** = dumdum

**dummy** /'dʌmi/ *noun* (*pl.* dummies), *adjective*
(*pl.* dummies) 1 *n* پەیکەرە، کۆتەڵ، مودێل، مانکەن: *a ventriloquist's dummy* 2 شتی قەڵب، شتی بۆ جوانی، شتی درۆ 3 مەمکەمژە، مەمکەشووشە، مەشقوولەک 4 بنیادەمی حەپۆل، کەر، گەوج *adj* قەستینە، درۆ، درۆزنە، ساختە، دەسکرد، قەڵب: *a dummy bomb* ◇ 1 *n* مانکن 2 چیز قلابی 3 پستانک 4 آدم خنگ *adj* قلابی، مصنوعی

**dummy run** *noun*
1 تاقی‌کردنەوە، جەڕەباندن 2 مەشق، کارکردن ◇ 1 امتحان 2 تمرین

**dump** /dʌmp/ *noun*
1 جێگای هەڵڕشتنی زبڵ‌وزاڵ، کۆما زبڵ، کوگای زبڵ و ئاشاخە 2 (سەربازی) عەماری کاتی 3 (نافەرمی) شوێنی پیس و ناخۆش، کەلاوە، کونەسەگ، گووخانە 4 (کامپیوتێر) کۆپی، لەبەرهەڵگرتنەوە ◇ 1 زباله‌دانی، کپه‌ی زباله 2 انبار موقت 3 (عامیانه) مکان کثیف 4 (کامپیوتر) کپی

**dumper** /'dʌmpə(r)/ *noun*, also dumper truck
ماشێنی بارهەڵڕێژ، بارکێش یان لۆری

(بار)هەڵڕێژ، بارکێشی ڕۆکەر ◌ کامیون کمپرسی

**dumping** /ˈdʌmpɪŋ/ *noun*

1 بازارشکێنی، نرخبەزێنی، هەرزانفرۆشی 2 ڕشتن، فڕێدان، دورخستنەوە ◌ 1 قیمت‌شکنی 2 تخلیه، دوراندازی

**dumping ground** *noun*

ئەشغاڵدان(ی)، زبڵدان، جێگای هەڵڕشتن یان داکردنی زبڵوزاڵ ◌ زباله‌دان

**dumpish** *adjective*

دڵتەنگ، خەمبار، وەڕەز ◌ افسرده

**dumpling** /ˈdʌmplɪŋ/ *noun*

پرپۆڵە ◌ دامپلینگ

**dumps** /dʌmps/ *noun, pl.* in the dumps

وەڕەز، بێ‌تاقەت، ناڕەحەت، دڵتەنگ، کز، مات ◌ دمغ، افسرده

**dump truck** = dumper

**dumpy** /ˈdʌmpi/ *adjective* (dumpier, dumpiest)

خڕیلانە، خەپەتولە، خەپە، خڕین، خڕوخۆڵ ◌ خپل (dumpiness *n* ،dumpily *adv*)

**dun**[1] /dʌn/ *adjective, noun*

1 *adj* قاوەیی توند، قاوەیی مەیلەوبۆر، دێز *n* 1 ڕەنگی قاوەیی تۆخ 2 جۆرێ ئەسپ ◌ *adj* قهوه‌ای تیره *n* 1 رنگ قهوه‌ای تیره 2 اسب سمند

**dun**[2] /dʌn/ *noun*

خاوەنقەرزی سوور یان هەراسان‌کردوو (لەسەر سەندنەوەی) ◌ بستانکار مصر

**dunam** /ˈdʊnəm/ *noun*

پێوەرێکی ڕووبەری زەوی لە چەندین ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست، وەکوو ئیسرائیل (بەرامبەر بە 900 میتری چوارگۆشە) ◌ دونام

**dunce** /dʌns/ *noun*

مرۆی گەمژە، دەبەنگ، کول، کەم‌هۆش، درەنگ‌تێگەیشتوو، حەپە ◌ آدم کندذهن، کودن

**dunce's cap** *noun,* also dunce cap

کڵاوی کاغزی، کڵاوەقیتە، کڵاوەتیژە، کڵاوەگێژە ◌ کلاه بوقی

**Dundee cake** *noun*

(بریتانیا) جۆرێ کەیکی پڕمیوە، بە بادەم دەڕازێتەوە ◌ نوعی کیک

**dunderhead** /ˈdʌndəhed/ *noun*

(نافەرمی) مرۆی گەوج ◌ آدم احمق

**dunderheaded** *adjective*

گەوج ◌ احمق

**dune** /djuːn, US duːn/ *noun*

گردەلم، تەپۆلکەلم، زورگی لمی (نزیک بە دەریا لە بیابان) ◌ تل‌ماسه

**dune buggy** = beach buggy

**dung** /dʌŋ/ *noun*

1 شیاکە، تەرس، سنێر، تەڤزین، تەرسەقوڵ، ڕیخ، پشقەڵ 2 پەیین (ی ماڵات) ◌ 1 تاپالە، پشکل 2 کود

**dungarees** /ˌdʌŋɡəˈriːz/ *noun*

1 جلوبەرگی کار، جلی کار، شەڵواری کار، شەڵواری بەرسینگ‌دار 2 (dungaree) جۆرێ calicoی زبری هیندی ◌ 1 شلوار کار 2 دانگاری

**dung-beetle** /ˈdʌŋbiːtl/ *noun*

خلێنکە، گووخرتەوکەرە، قالونچە، ب.ت. scarab ◌ دانگ بیتل

**dungeon** /ˈdʌndʒən/ *noun*

1 چاڵەڕەش، دەخمە، زیندانی ژێرعەرز (ب.ت. لە قەڵادا): *Throw him into the dungeons!* 2 = donjon ◌ 1 دخمه 2 = donjon

**dung fly** *noun*

مێشەپەیینە (گەراکانی لەسەر پەیینی تازە دادەنێ و جۆرەکانی تر) [*Scathophaga stercoraria*] ◌ نوعی مگس

**dunghill** /ˈdʌŋhɪl/ *noun*

کۆماپەیین، کۆگاپەیین، لۆدەپەیین ◌ کپه‌ی کود

**dungworm** /ˈdʌŋwɔːm/ *noun*

کرمەپەیینە ◌ نوعی کرم

**dunite** /ˈdʌnʌɪt/ *noun*

(زەوی‌ناسی) دانایت، دانیت: بەردێکی ئاگرینی دەنک‌زبر، زۆربەی olivine پێکدێنێ (بنەڕەت: لە ناوی چیای *Dun* لە نیوزیلەند) ◌ دونیت

**dunlin** /ˈdʌnlɪn/ *noun, pl.* same or dunlins

جۆرێ شێلاقەی کوچەری ئاسایی [*Calidris alpina*] ◌ نوعی آبچلیک

**dunnage** /ˈdʌnɪdʒ/ *noun*

1 پووش، کاوپووش 2 بارگەوبنە، بار، کەلوپەل ◌ 1 پوشال 2 بار و بنه

**dunnart** /ˈdʌnɑːt/ *noun*

جۆرێ marsupialی مێروخۆری مشک‌ئاسای لمۆزتیژ و چاودەرپەڕیو، لە ئەوسترالیا و نیوگینی دەبینرێ [*Sminthopsis murina* و جۆرە پێوەندی‌دارەکان] ◌ دونارت

**dunnock** /ˈdʌnək/ *noun,* hedge sparrow

چۆلەکە، مەلیچک، پاساری، چویک، سیفاندۆک، لە خێزانی accentor، سەری بۆری توندە [*Prunella modularis*] ◌ گنجشک

**dunny** /ˈdʌni/ *noun*

(نافەرمی، ئەوسترالیا) دەس‌بەئاو، مستەڕا ◌ توالت

**duo** /ˈdjuːəʊ, US ˈduːoʊ/ *noun, pl.* duos

1 جووت 2 دوئێت (پارچە موسیقایێ بۆ دوو گۆرانی‌بێژ یا دوو موسیقاژەن) ◌ 1 زوج 2 دوئت

**duo-** *prefix*

پێشگر: دوو: *duologue* ،*duopoly* (بنەڕەت: لە لاتینەوە) ◌ پیشوند: دو

**duodecillion** *noun*

دیۆدیسیلیۆن: ژمارەی یەک بە 72 سیفر لە پێشی‌یەوە ◌ عدد یک با 72 صفر

**duodecimal** /ˌdjuːə(ʊ)ˈdɛsɪm(ə)l/

*adjective*
(بیرکاری) دوازدەیی، دوانزەیی ◌ دوازدهی
**duodecimal system** *noun*
دەزگا یان ریکخستەی دوازدەیی ◌ دستگاه دوازدهی
**duodecimo** /ˌdjuːə(ʊ)ˈdɛsɪməʊ/ *noun, pl.* duodecimos
ئەندازەی کتێبێ کە هەر پەڕێکی دوازدەیەکی ئەندازەی پەڕێکی چاپکراو بێ ◌ دیودیسیمو
**duoden(o)-** *prefix*
پێشگر: دوازدەگرێ ◌ پیشوند: دوازدهه
**duodenal** /ˌdjuːəˈdiːnl, US ˌduːə-/ *adjective*
سەربە دوازدەگرێ، دوازدەگرییی ◌ وابسته به اثنی‌عشر، وابسته به دوازدهه
**duodenal ulcer** *noun*
برینی دوازدەگرێ ◌ زخم اثنی‌عشر
**duodenitis** /-ˈnʌɪtɪs/ *noun*
ئاوسان یان هەوکردنی دوازدەگرێ ◌ التهاب اثنی‌عشر
**duodenum** /ˌdjuːəˈdiːnəm, US ˌduːə-/ *noun, pl.* duodenums or duodena /-ˈdiːnə/
(توێکاری) دوازدەگرێ، دوانزەگرێ (بنەڕەت: لە ئینگلیسی نێوەڕاستەوە، لە لاتینی نوێ، لە "لە دوازدەدا" *duodeni*، درێژاییەکەی بەرامبەر بوو نزیکە بە پانایی دوازدە قامک) ◌ اثنی‌عشر، دوازدهه
**duologue** /ˈdjʊəlɒg/ *noun*
وتووێژ، هەڤپەیڤین، گفتوگۆ (ی دووکەس پێکەوە) ◌ گفتگو
**duomo** /ˈdwəʊməʊ/ *noun, pl.* duomos
سەرکلێسەی cathedral ئیتالیا ◌ کلیسای جامع ایتالیا
**duopoly** /djʊˈɒpəli/ *noun, pl.* duopolies
پاوانیتی فرۆش لە نێوان دوو کەسا، پاوانی دووکەسە ◌ انحصار دونفری
**dupable** *adjective*
سادە، ساویلکە، زوو فریو دەدرێ، لەخشتەدەچێ ◌ فریب‌دادنی
**dupe** /djuːp, US duːp/ *noun*
1 کەسێکی ساویلکە، سادە، هەڵفریواو، تەفرەدراو، لەخشتەچوو، فریودراو: *These men were simply the dupes of their unscrupulous leaders* 2 – duplicate ◌ آدم ساده‌لوح
**duper** *noun*
فریودەر، هەڵفریوێنەر، لەخشتەبەر ◌ فریبنده
**dupery** /ˈdjuːpəri/ *noun*
هەڵفریواندن، فریودان، لەخشتەبردن، فریو ◌ فریب
**duple** /ˈdjuːp(ə)l/ *noun*
دووبەشە، دووکەرتی، دووانە ◌ دوجزئی
**duplet** /ˈdjuːplɪt/ *noun*
دەستی دوودانەیی، جووت ◌ مجموعەی دوتایی
**duple time** *noun*
(موسیقا) ریتمێ لەگەڵ دوو ترپە لە باریکدا bar ◌ میزان دوضربی
**duplex** /ˈdjuːpleks, US ˈduː-/ *adjective, noun*
1 *adj* جووت، دووبەشە، دووبەشی، دوولۆنە 2 دووانە *n* 1 ماڵ یان خانووبەرەی دوودەستە، دەزگای دووبەشە، هەریەک لەو بەشانە، دەستە، دیوپلێکس، دوبلێکس 2 (پرینتێر) دەتوانێ هەر دوو بەرەکە چاپ کا، دووبەرە 3 (سیستەمەکانی پێوەندی، سێرکیتی کامپیوتێر و هتد) دەتوانێ هاوکات دوو سیگناڵ و پەیام بۆ چەند لای بەرامبەر راگوێزێ ◌ *adj* 1 دوتایی، دوبخشی، دولایی 2 دوقلو *n* 1، 2 و 3 دوبلکس
**duplicate**[1] /ˈdjuːplɪkət, US ˈduː-/ *adjective*
1 دووبەرامبەر، دووئەوندە، دووچەندان، دووباد 2 وەکوویەک، وەکیەک، هاوشێوە، هاوتا، هاوجووت، دەقاودەق، لێکچوو: *duplicate invoices ◊ copies* 3 دووپەری، دووڕوونووسی 4 دوانەیی، جووت ◌ 1 دوبرابر 2 همانند، نظیر 3 دونسخه‌ای 4 دوتایی
**duplicate**[2] /ˈdjuːplɪkət, US ˈduː-/ *noun*
1 تا، لف، جووت 2 ڕوونووس، کۆپی 3 (کۆپی)ڕوونووسی دووەم یان زیادی ◌ 1 لنگه 2 روگرفت 3 نسخه‌ی ثانی
**duplication** /ˌdjuːplɪˈkeɪʃn, US ˌduː-/ *noun*
1 کۆپی، ڕوونووس، لەبەرهەڵگرتنەوە، لەبەرنووسینەوە 2 دووبارەکردنەوە، دووپاتکردنەوە (تایپۆیست) 3 دووبەرامبەرکردن، دووچەندانەکردن ◌ 1 رونوشت 2 تکرار 3 مضاعف‌سازی
**duplicator** /djuːplɪkeɪtə(r), US ˈduː-/ *noun*
دەزگای لەبەرهەڵگرتنەوە، دەزگای لێهەڵگرتنەوە ◌ دستگاه فتوکپی
**duplicitous** /djuːˈplɪsɪtəs, US duː-/ *adjective*
فێلاوی، بەفێڵ، تەڵەکەباز، دووزمان، گزەون، بەقەڵەودەڵە، فێڵەباز، فریودەر، دەسبڕ ◌ حقه‌باز، متقلب، حیله‌گر (duplicitously *adv*)
**duplicity** /djuːˈplɪsəti, US duː-/ *noun*
1 فێڵ، دەغەڵ، فریودان، هەڵفریواندن، تەفرە، دووڕوویی، ریاییبازی 2 (کۆن) دوولۆنەیی ◌ 1 خدعه، نیرنگ، ریا 2 دولایی
**duppy** /ˈdʌpi/ *noun, pl.* duppies
(سووریێستەکان) رۆح یان تارمایی بەدنیار ◌ روح یا شبح بدخواه

**durability** /ˌdjʊərəˈbɪləti, US ˌdʊr-/ *noun*, also durableness
1 بەرگـەگرتوویی، کـارگیری، خۆگرتـوویی، بـەگیری، نـەدری، رەختـەیی، قـایمی: *the durability of gold* ◊ *This rope is renowned for its high level of strength and durability* 2 بـەردەوامی، مانـەوە، جێگیری، سەقامگرتوویی ◯ 1 دوام 2 ماندگاری

**durable** /ˈdjʊərəbl, US ˈdʊr-/ *adjective*
1 بەرگـەگرتوو، کـارگیر، بەرگـەگر، خۆگرتـوو، بەدەوام، بەگیر، نەدر، رەختە، قایم 2 بەردەوام، ماوە، جێگیر، سەقامگرتوو، درێژخایـەن، کۆن: *-able plastics* ◊ *negotiations for a -able peace* ◯ 1 بادوام 2 ماندگار

**durable goods** *noun, pl.*, also durables
کـەلوپـەلی بەرگـەگر، شـتومـەکی کـارگیر ◯ کالاهای بادوام

**durably** /ˈdjʊərəblɪ, US ˈdʊr-/ *adverb*
بەرگەگرتووانە، بە شێوەیەکی بەرگـەگرتوو ◯ به طور بادوام

**Duraluumin** /djʊˈræljʊmɪn/ *noun*
(دروشمی بازرگانی) دورالومین (تێکەڵـەیەکە لـە مس، مەنگەنیز و ئالومینیۆم) ◯ دورالومین

**dura mater** /ˌdjʊərə ˈmeɪtə/ *noun*
(توێکاری) پەردەرەقە، پەردەی قایم، قایمەپەردە (مێـشک و درکـەمۆخ دادەپۆشـێ، لـە لاتـینی سەدەکانی نێوەڕاست بە واتای دایکی رەق یـان سـەخـت، وەرگێـردراوی *al-'umm al-jāfiya* عەرەبی) ◯ سخت‌شامه، امالغلیظ، امالدماغ

**dural** *adjective*
سـەربە پەردەرەقـە، سـەربـە dura mater ◯ وابسته به سخت‌شامه

**duramen** /djʊˈreɪmɛn/ *noun*
1 (رووەکناسی) دڵی دار، نێرک (لە لاتینەوە بە واتـای سـەخـتی یـان رەقـی "hardness") 2 سەختی، رەقی ◯ 1 دلچوب 2 سختی

**durance** /ˈdjuːrəns, US ˈduːrəns/ *noun*
1 گـرتن، دەسبەسـەرداگرتن، گـڵدانـەوە، زینداني‌کردن 2 زیندان، گرتووخانە ◯ 1 توقیف 2 زندان

**duration** /djuˈreɪʃn, US du-/ *noun*
1 بەردەوامی، مانەوە، خایەن، ماوە: *The school was used as a hospital for the duration of the war* 2 (زمانەوانی) خایاندن ◯ 1 استمرار، مدت 2 (زبان‌شناسی) دیرش

**durational** *adjective*
سەربە duration ◯ وابسته به duration

**durative** /ˈdjʊərətɪv, US ˈdʊr-/ *adjective*
(رێزمـان) سـەربـە خایانـدن ◯ (دسـتور زبـان) وابسته به دیرش

**durbar** /ˈdɜːbɑː/ *noun*
(مێژوویی) بارەگا یان دەرباری دەسەڵاتداراني هیند (لە *darbār* ی فارسییەوە وەرگیراوە) ◯ دربار

**durchkomponiert** /ˌdʊəxˈkɒmpɒnɪət, German ˌdʊrçkɔmpoˈniːrt/ *adjective*
خاوەنی دوو موسیقای جیاواز بۆ هەر هۆنراوەیێ ◯ دورچ‌کومپونیرت

**duress** /djuˈres, US du-/ *noun*
گوشار، زۆرەملی، زۆر، زۆرلێ‌کردن، هەڵـێچان، تەنگـەتاوکـردن، تـاوادان، تونـدوتیژی، زەبروزەنـگ، سـەنگی، هەڕەشـە، تۆقانـدن، ئەشکەنجە، جەزرەبە ◯ اجبار، اکراه، فشار، جبر، ارعاب، شکنجه

**Durex** /ˈdjʊəreks, US ˈdjʊr-/ *noun, pl.* same
(بریتانیا، دروشمی بازرگانی) جیر، کاندۆم ◯ کاندوم

**durian** /ˈdʊərɪən/ *noun*
1 جۆرێ میوە 2 (هـەروەهـا durian tree) داری ئەو میوەیە (دارێکی زلەی مالیزیایی [ *Durio zibethinus*]) ◯ دورین

**duricrust** /ˈdjʊərɪkrʌst/ *noun*
(زەویناسی) توێکڵەرەقە ◯ دوری‌کراست

**during** /ˈdjʊərɪŋ, US ˈdʊr-/ *preposition*
بە درێژایـی، لـە، لـە مـاوەی، لـەنێو(ان)، کـاتی، وەختی، سـەردەمی: *swims every day during the summer* ◯ در طـول، در، در طـول مـدت، هنگام

**durmast oak** /ˈdɜːmɑːst/ = sessile oak

**duroc** *noun*, also Duroc-Jersey or Duroc
جۆرێ بەرازی گەورە و سووری ئەمریکایی ◯ نوعی خوک

**durra** /ˈdʊrə, US ˈdʊərə/ *noun*
جـۆرێ sorghum، لـە بـاکووری رۆژهـەڵاتی ئەفریکاوە تا هیند شین دەبێ، هـەرزنی هیندی ◯ دوره

**durum wheat** /ˈdjʊərəm/ *noun*
جۆرێ گەنمی رەق، لە بیابانە وشکەکاندا شین دەبێ [*Triticum durum*] ◯ نوعی گندم

**durst** = archaic past of dare

**durzi** /ˈdɜːzi/ *noun, pl.* durzis
(لە هیند) دەرزی، بەرگدروو ◯ درزی، خیاط

**dusk** /dʌsk/ *noun*
(وێژەیـی) زەردەپـەڕ، لای ئێـوارە، درەنگـان، تاریکـان، شێوان، خـۆراوا، رۆژاوا: *The street lights go on at dusk* ◯ شفق، غروب

**duskiness** /ˈdʌskinəs/ *noun*
تـۆخی، تێـری، تونـدی، پـڕرەنگی، تـاریکی، بێ‌شەوقی ◯ تیرگی، تاریکی

**dusky** /ˈdʌski/ *adjective* (duskier, duskiest)
1 (رەنـگ) تـۆخ، تێـر، تونـد، پـڕرەنگ، تاریـک،

*the dusky light inside the cave* : کەمشەوق 2 *dusky pink* ◊ (شەوق) کەم 3 (زۆرتر وەکوو جنێو) رەش، قولەرەشە ◌ 1 تیره، تاریک 2 (نور) خفیف 3 سیاه‌پوست

**Dussehra** /ˈdʌʃərə/ *noun*
داشێرا (شەوی دەیەم و دوایی فێستیڤاڵی هێندی Navaratri) ◌ داشرا

**dust** /dʌst/ *noun*
1 خۆڵوخاک، تەپوتۆز، سۆنگ، تۆز 2 گەردە، هەلالە، خاکە، هاڕاوە 3 سووکی، چرووکی، خوێڕیەتی، نزمی 4 شتی سووک یان هیچەکە 5 (وێژەیی) خاکە، پاشماوەی کەسێکی مردوو ◌ 1 گرد و خاک، غبار 2 پودر، گرد 3 خفت، خواری 4 چیز بی‌ارزش 5 باقی‌ماندەی جسد مرده

**dust bath** *noun*
(باڵندە) خۆڵەپرژێ، خۆڵەخۆڵوەردان ◌ داست باس

**dustbin** /ˈdʌstbɪn/ *noun*
تەنەکەی خۆڵ، سەتڵی زبڵ، زبڵدان ◌ سطل زباله

**dustbin man** = dustman

**dustbowl** *noun*
چۆڵگە، دەشت، دەشتی تۆزگر، دەشتی کاکی بەکاکی (ناوچەیەکی تۆزاوی و زۆر دەمێکیش بارانەباریو) ◌ بیابان برهوت

**dustbrush** /ˈdʌstbrʌʃ/ *noun*
تۆزسڕ، تۆزگیر ◌ گردگیر

**dustcart** /ˈdʌstkɑːt, US -kɑːrt/ *noun*
ماشێنی بردنی زبڵوزاڵ، زبڵکێش، زبڵڕێژ ◌ کامیون حمل اشغال

**dust coat** /ˈdʌst kəʊt/ *noun*
جلی سەرەوە، بەرگی تۆزگر ◌ لباس گردگیر

**dust cover** *noun*
(کتێب) (سەر)بەرگ، رووپۆش ◌ روکش

**dust devil** *noun*
گێژەڵووکە، گەردەلوول ◌ گردباد

**duster** /ˈdʌstə(r)/ *noun*
1 پەڕۆ یا دەسرەی سڕین 2 (هەروەها duster coat) رووپۆشی تۆزگیر، تۆزسڕ، تۆزگیر، جۆرێ رووپۆشی سووک و فشی بێ‌دوگمە (ب.ت. لە سەفەردا و بە ماشێنی سەرناوالە) 3 تەختەسڕ، سڕە 4 ئادوودە 5 جلی سووکی مالەوە کە تا سەرچۆک دێ 6 دەزگایێ بۆ لێدانی تۆز، گەردە، مێرووکوژ و یان شتێکی وا 7 (هەروەها crop-duster) کەسێ کە بە فڕۆکەیێکی نزمفڕ تۆز و گەردە مێرووکوژەکان بەسەر بەرهەم و حاسڵدا دەکا، دەرمانلێدەر 8 = (نافەرمی) dust storm ◌ 1 دستمال گردگیری 2 لباس گردگیری 3 تخته‌پاک‌کن 4 گردگیر 5 و 6 داستر 7 سم‌پاش

**dusting-brush** /ˈdʌstɪŋ brʌʃ/ *noun*
ئادوودە، تۆزتەکێن، داری پەڕبەسەر ◌ گردگیر

**dust jacket** *noun*
(کتێب) (سەر)بەرگ، رووپۆش، کاغزی بەرگی کتێب ◌ روکش

**dustman** /ˈdʌstmən/ *noun, pl.* dustmen
پاکەوان، زبڵڕێژ، سپوور، گسکدەر ◌ رفتگر، اشغالی

**dustpan** /ˈdʌstpæn/ *noun*
خاکماڵ، خۆڵڕێژ، خاکەناز، هێستیفک، مەدوونە ◌ خاک‌انداز

**dustproof** *adjective*
تۆزنەگر ◌ داست‌پروف

**dustsheet** *noun*
مەلافە، مێتێل، بەرگ، روو، سەرپۆش (کەلوپەلی نیومال) ◌ ملافه

**dust storm** *noun*
رەشەبای تەپوتۆز، رەشەبای خۆڵوخاک ◌ توفان گرد و غبار

**dust-up** *noun*
(نافەرمی) شەڕ، شەڕوکێشە، سەرمەسەرم، هەلا، بگرەوبەردە، قرەقر ◌ دعوا، بگومگو، داد و قال

**dusty** /ˈdʌsti/ *adjective* (dustier, dustiest)
1 تۆزاوی، خۆلاوی، تەپوتۆزاوی، تۆزگرتوو، تۆزلێنیشتوو، تۆزئاسا، خۆڵئاسا: *a dusty road* ◊ *piles of dusty books* 2 (رەنگ) تەلخ، لێل، مات: *dusty pink* 3 وشک، بێتام، ناخۆش: *dusty scholarship* ◌ 1 گردگرفته، غبارآلود، گردمانند 2 (رنگ) تیره، کدر 3 بی‌روح

**dusty answer** *noun*
وەلامی نا، وەلامی رەد ◌ جواب رد

**dusty miller** *noun*
رووەکێ لە تیرەی daisy، بە گەلاوێزی مەیلەوسپی یان ئاماڵبۆرەوە [ *Artemisia* (هی ئەمریکای باکووری)، *Senecio stellerana* (هی مەدیتەرانە) و جۆرەکانی تر *cineraria* ] ◌ نوعی گیاه

**Dutch** /dʌtʃ/ *adjective, noun*
*adj* سەربە هولەند، هولەندی، هۆلەندی *n* 1 زمانی (ئەڵمانی رۆژاوا) هولەندی 2 (کۆن) ئەڵمانییەکان 3 (ئەفریکای باشووری، سووکانە) = Afrikaans ◌ *adj* وابسته به هلند *n* 1 زبان هلندی 2 آلمانی‌ها

**the Dutch** *noun*
خەڵکی هولەند، هولەندییەکان ◌ مردم هلند

**Dutch auction** *noun*
هەراج یان هەرزانفرۆشی هولەندی ◌ حراج هلندی

**Dutch barn** *noun*
(بریتانیا) کەپر، لۆپک ◌ آلاچیق

**Dutch cap** *noun*
1 کلاوی هولەندی (وەکوو بەشێ لە بەرگی خۆماڵی هولەندی لەسەر دەکرێ) 2 دەزگا (ژنان

نیوبــەدەرەوەیی، ناوودەنــگ 3 پیاهەڵــوتن، پەسن‌دان، پیاهەڵدان، چەپڵەلێدان 4 شانازی ◌ 1 درخشش، موفقیت برجسته 2 شهرت 3 تحسین 4 افتخار

**ecletic** /ɪ'klektɪk/ *adjective, noun*
*adj* 1 هەڵــبژاردەخــواز، بــاش‌هەڵــبژێر 2 (Ecletic) سەربە چینێ لە فیلسووفانی زوو کە ڕێبازەکانیان لە چەندین قوتابخانەی بیری‌یەوە هەڵـدەبژارد *n* کـەسـێکی بـاش‌هـەڵـبژێر (لـە *eklektikos* یونانی، لە *eklegein* "هەڵبژاردن") ◌ *adj* 1 التقـاطی، بـەگـزین 2 ایکلیتیـک *n* آدم بەگزین

**ecletically** /-tɪkli/ *adverb*
هەڵبژاردەخوازانە ◌ به طور التقاطی

**eclecticism** /ɪ'klektɪsɪzəm/ *noun*
هەڵــــبژاردەخوازی، هەڵــــبژاردەگەری، باش‌هەڵبژێری ◌ التقاط‌گرایی

**eclecticist** /ɪ'klektɪst/ *noun*
هەڵبژاردەخواز، هەڵبژاردەگەر، باش‌هەڵبژێر ◌ التقاط‌گرای

**eclipse** /ɪ'klɪps/ *noun*
1 مانــگ‌گــیران، خــۆرگیران، ڕۆژگــیران 2 پووکانــەوە، کوێربوونــەوە، لەبیرچوونــەوە، دیارنـەبوون، لێلایی‌داهـاتن ◌ 1 مـاەگرفتگـی، خسـوف، خوشیدگرفتگی، کسوف 2 افول، غیبت

**eclipse of the moon** *noun*
مانگ‌گیران ◌ خسوف، مەگرفت

**eclipse of the sun** *noun*
ڕۆژگیران، خۆرگیران ◌ کسوف، خورگرفت

**ecliptic** /ɪ'klɪptɪk/ *noun, adjective*
*adj* (ئەستێرەوانی) *n* ئیکلیپتیک، سوورگەی ڕۆژ سەربە مانگ‌گیران یان ڕۆژگیران، گیرانی ◌ *n* دایرەالبروج *adj* خسوفی، کسوفی

**eclogue** /'ɛklɒg/ *noun*
هۆنـە یـا سـرودی شـوانی (بنـەڕەت: لـە *eklogē* یۆنانی "هەڵبژاردن") ◌ سرود چوپانی

**eclosion** *noun*
(مێروونـاسـی) 1 هـەڵـێنان، سـەرجووقانـدن، سـەردەرهێنـان: هاتنـەدەرێـی مێروویێکـی پێگەیشتوو لە قاپیلکەی کرمۆکەیی pupal case 2 هەڵێنان: هەڵێنانی hatching کرمۆکەیی لە گەراکەی ◌ اکلوسیون

**eco-** /'iːkəʊ, US 'iːkoʊ/ *prefix*
پێـشـگر: 1 دەوروپـشـت، مەڵـبەند، دەوروبـەر، ژینگـە 2 *ecospecies* سـەربە ئیکۆلـۆژی، ژینگەیی: *ecocatastrophe* (بنـەڕەت: لە *oikos* یونانی‌یەوە "house") ◌ پیشوند: 1 محیط، بـوم، پیرامون 2 وابسته به بوم‌شناسی

**ecocatastrophe** *noun*
ژینگـەکارەسـات، بـووروووداو، بووکـارەسـات: کارەسـات یـان ڕووداوێکـی بەربڵاو کە بووەتە هـۆی کۆمـەڵـە گـۆڕانێکی خـراپ و بـەزیـان لە ژینگەدا detrimental change ◌ فاجعـەی زیست‌محیطی

**ecocide** /'iːkəʊsaɪd, US 'iːkoʊ-/ *noun*
ئیکۆسـایـد، ژینگـەکوژی، فەوتانـدنی ژینگـە، ژینگەقڕان ◌ اکوساید

**eco-friendly** *adjective*
ژینگەدۆست، بێ‌زیـان بـۆ ژینگـە، ژینگـەپارێز، ژینگەوان ◌ اکوفرینڈلی

**Ecoli** /ˌiː 'kəʊlaɪ, US 'koʊ-/ *noun*, also E.coli
ئیکۆلی (جۆرێ بەکتریا، *Escherichia coli* لە ڕیخۆڵەی مرۆڤ و گیانەوەرانی تر) ◌ اکولی

**ecological** /ˌiːkə'lɒdʒɪkl, US -'lɑːdʒ-/ *adjective*
1 بـوومناسی‌یانـە، مەڵبەندناسـی‌یانە، سـەربە یـا پێوەندی بە ژینگەناسی‌یەوە هەیـە 2 ژینگەپارێز، بوومپارێز ◌ 1 بوم‌شناختی 2 بوم‌دوست

**ecological balance** *noun*
هاوسەنگی بوومناسی‌یانە یان ژینگەناسی‌یانە ◌ تعادل بوم‌شناختی

**ecologically** /-kli/ *adverb*
لەباری ژینگەناسی‌ی(ان)ەوە، ژینگەناسـانە ◌ از نظر بوم‌شناختی

**ecologist** /i'kɒlədʒɪst, US i'kɑːl-/ *noun*
1 ژینگــەناس، مەڵــبەندناس، بــوومنــاس 2 ژینگــەپارێز، ژینگــەوان ◌ 1 بــوم‌شــناس 2 بوم‌دوست

**ecology** /i'kɒlədʒi, US i'kɑːl-/ *noun*
ژینگەناسی، بـوو(م)ناسـی، مەڵبەندناسـی: *the ecology movement* ◌ بوم‌شناسی

**e-comm** *abbreviation* e-commerce

**e-commerce** *noun*, also e-comm abbreviation e-commerce
کارداری یان بازرگـانی ئینتێرنێتی، ئی‌کامێرس ◌ ای‌کامرس

**Econ** *abbreviation* Economics

**econometric** *adjective*, also econometrical
سەربە ئابووری‌پێوی ◌ وابسته به اقتصادسنجی

**econometric model** *noun*
نموونـە یـان مـودێلی ئـابووری‌پێـوی ◌ الگـوی اقتصادسنجی

**econometrics** /ɪˌkɒnə'metrɪks/ *noun, pl.*
ئابووری‌پێوی ◌ اقتصادسنجی

**economic** /ˌiːkə'nɒmɪk, ˌekə-, US -'nɑːm-/ *adjective*
1 ئـابووری، سـەربە ئـابووری: *economic growth/cooperation* 2 سـەربە بازرگـانی یـان پیشەسازی 3 بـەخێر، خێـردەرەوە، پـرداهات، بـەقازانج، بەسـوود، پرسـوود ◌ 1 اقتـصادی 2 وابسته به تجارت یا صنعت 3 باصرفه

**economical** /ˌiːkəˈnɒmɪkl, ˌekə-, US -ˈnɑːm-/ *adjective*
1 پرداهات، خێردەرەوە، بەقازانج 2 دەسپێوەگر، نادەسبلاو 3 کورت، پوخت (قسە) ◌ 1 باصرفه 2 مقتصد 3 موجز

**economically** /ˌiːkəˈnɒmɪkli, ˌekə-, US -ˈnɑːm-/ *adverb*
لەباری ئابووری‌یەوە: *the economically active* ◌ از لحاظ اقتصادی

**economic determinism** *noun*
دیتێرمینیزمی ئابووری ◌ جبرگرایی اقتصادی

**economic development** *noun*
پەرەسەندنی ئابووری، پێشکەوتنی ئابووری ◌ توسعەی اقتصادی

**economic dynamics** *noun*
جم‌وجۆڵی ئابووری، بزاوتی ئابووری ◌ تحرک اقتصادی

**economic ends** *noun, pl.*
ئامانجە یان مەبەستە ئابووری‌یەکان ◌ اهداف اقتصادی

**economic geography** *noun*
جوگرافیای ئابووری ◌ جغرافیای اقتصادی

**economic growth** *noun*
هەڵدانی ئابووری، گەشەی ئابووری ◌ رشد اقتصادی

**economic independence** *noun*
سەربەخۆیی ئابووری ◌ استقلال اقتصادی

**economic life** *noun*
تەمەنی (بەقازانجی) ئابووری ◌ عمر اقتصادی

**economic policy** *noun*
رامیاریی یان سیاسەتی ئابووری ◌ سیاست اقتصادی

**economic power** *noun*
هێزی ئابووری، دەسەڵاتی ئابووری ◌ قدرت اقتصادی

**economics** /ˌiːkəˈnɒmɪks, ˌekə-, US -ˈnɑːm-/ *noun, pl.*
زانستی ئابووری، ئابووری‌ناسی، ماڵداری، ئابووری، تیۆری، بنەما یان کرداری ئابووری: *The economics of the project are very Keynesian/Marxist* ◊ *encouraging economics* ◌ علم اقتصاد، اقتصاد، اکونومی

**economic sanctions** *noun, pl.*
گەمارۆ یان ئابلۆقە یان سزا ئابووری‌یەکان ◌ تحریم‌های اقتصادی

**economic warfare** *noun*
شەڕی ئابووری ◌ نبرد اقتصادی

**economism** /ɪˈkɒnəmɪz(ə)m/ *noun*
ئابووری‌گەری، ئابووری‌خوازی ◌ اقتصادگرایی

**economist** /ɪˈkɒnəmɪst, US ɪˈkɑːn-/ *noun*
ئابووری‌زان، زانای ئابووری ◌ اقتصاددان

**economization** *noun*
دەس‌گیرۆیی، دەس‌پێوەگرتن ◌ صرفه‌جویی

**economy** /ɪˈkɒnəmi, US ɪˈkɑːn-/ *noun, pl.* economies
1 ئابووری 2 دەس‌پێوەگرتن، ماڵداری 3 ڕێکخستە یان سیستمی ئابووری 4 (وەک ئاوەڵناو) خێردەرەوە، پرداهات، بەقازانج، بەخێر ◌ 1 اقتصاد 2 صرفه‌جویی 3 نظام اقتصادی 4 (صفت‌گونه) مقرون به صرفه

**economy class** *noun*
(تیکێتی فڕۆکە) پلە دوو، نمرە دوو (هەرزانترین جۆری کورسی) ◌ درجه دو

**economy class syndrome** *noun*
نەخۆشی‌یەکی توندە کە لەودا خەڵک خوێنیان جەڵغە دەبەستێ، چونکو بۆ ماوەیەکی زۆر لە شوێنێکی چکۆلەدا لەسەر فڕۆکەدا دانیشتوون) ◌ اکونومی کلاس سیندروم

**écorché** /ˌeɪkɔːˈʃeɪ/ *noun, pl.* pronounced same
وێنە یا وێنەکێشی توێکاری‌یانە ◌ تصویر تشریحی

**ecosphere** *noun*
ژینگەگۆ، چینی ژینگە، چینەژینە، بایۆسفێر، the biosphere، ناوچەیێ کە بۆ ژیان دەبێ و ژینی تیا دەکرێ ◌ بوم‌کره

**ecosystem** /ˈiːkəʊsɪstəm, US ˈiːkoʊ-/ *noun*
ئیکۆسیستم، ژینگەڕێکخستە، بوو(م)ڕێکخستە، ژینگەسیستم، بوو(م)سیستم ◌ بوم‌سامانه

**ecoterrorism** /ˈiːkəʊterərɪzəm, US ˈiːkoʊ-/ *noun*
ژینگەتیرۆرکاری، ئیکۆتیرۆرکاری ◌ اکوتروریسم

**ecoterrorist** /ˈiːkəʊterərɪst, US ˈiːkoʊ-/ *noun*
ژینگەتیرۆرکار، ئیکۆتیرۆرکار ◌ اکوتروریست

**ecotourism** /ˈiːkəʊtʊərɪzəm, -tɔːr-, US ˈiːkoʊtʊr-/ *noun*
ژینگەگەڕوانی، گەڕوانیی ژینگە، ئیکۆتووریزم ◌ اکوتوریسم

**ecotourist** /ˈiːkəʊtʊərɪst, -tɔːr-, US ˈiːkoʊtʊr-/ *noun*
ئیکۆگەڕوان، ژینگەگەڕوان، ئیکۆتووریست ◌ اکوتوریست

**ecru** /ˈeɪkruː, US ˈekruː/ *noun*
ڕەنگی قاوەیی پەمەیی، ڕەنگی نۆک‌باو ◌ رنگ قهوه‌ای صورتی

**ecstasy** /ˈekstəsi/ *noun, pl.* ecstasies
1 شاگەشکەیی، سەرخۆشی گەشکەلێ‌هاتن، شادی، خۆشی، سەرمەستی، مەستی، حاڵ، لەخۆبوونەوە، حاڵ‌لێهاتن، وڕێنە، ڕاوان 2 (Ecstasy) دەرمانی مەستێنەر، مەستێنە، دەرمانی شاگەشکە، خۆشی‌هێن (دەرمانێکی ناقانوونی کە

زۆرتر له لایەن گەنجانەوه له میوانی، یانه و... دەخورێ (کورتەکەی E) ◌ 1 وجد، شعف، شور، نشئه، جذبه، خلسه، هذیان 2 (Ecstasy) اکستسی

**ecstatic** /ɪk'stætɪk/ *adjective, noun*

*adj* خۆشی‌هێنەر، بەشەوق‌هێنەر، بەگورخەر، خۆش، بەگور، بەپەرۆش، ورووژاو، هەژیو، سەرخۆش، سەرمەست، شاگەشکە، حاڵ‌پێهێن: *n ecstatic applause/praise/reviews* کەسێ که زووزوو حاڵی لێدێ ◌ *adj* پرشور، وجدآور، هیجانزده، خلسه‌انگیز *n* اکستاتیک

**ecstatically** /-kli/ *adverb*

به تین‌وگورەوه، به خۆشی‌یەوه: *For a time, we were ecstatically happy* ◌ با شور و شوق، با وجد

**ECT** *abbreviation* electroconvulsive therapy

ئی‌سی‌تی، چارەسەری به تەزووی ئێلیکتریسیته یان کارەبا ◌ ای‌سی‌تی

**ect(o)-** *prefix*

پێشگر: دەرەوه، دەرەکی، دەرەوەیی: *ectoparasite* (بنەڕەت: له *ektos* یونانی‌یەوه "outside") ◌ پیشوند: برون، برونی

**ectoderm** /'ɛktə(ʊ)dəːm/ *noun*

دەرەپێست، پەردەی دەرەوه، دەرەوەترین توێی خانه یا شانەی ئاوەڵمەیێ، یان ئەو بەشانەی لەوەوه پێکهاتوون (وەکوو epidermis) ◌ اکتودرم

**ectodermal** *adjective*

دەرەپێستی، سەربه پەردەی دەرەوه ◌ وابسته به اکتودرم

**ectogenesis** /ˌɛktə(ʊ)'dʒɛnɪsɪs/ *noun*

(پتر له چیرۆکه زانستی‌یەکاندا) پەرەسەندنی ئاوەڵمه له دەرەوەی منداڵدانا، دەر(ە)پێکهات، پێکهاتن له دەرەوه ◌ اکتوجنسیس

**ectogenetic** *adjective*

سەربه ectogenesis، دەر(ە)پێکهاتی ◌ وابسته به اکتوجنسیس

**ectomere** *noun*

دەر(ە)پارژه: هەریەک لەو بلاستومیرانەی blastomere کە بەشداری پەرەسەندن و هەڵدانی ecroderm دەکەن ◌ اکتومر

**ectomeric** *adjective*

سەربه یان پێوەندی به ectomere ەوه هەیه ◌ وابسته به اکتومر

**-ectomy** *suffix*

پاشگر: ـبڕی، ـدەرکێشی، ـهەڵکێشی، دەرکێشان، هەڵکێشان، لابردن به نەشتەرگەری: *gastrectomy* ،*appendectomy* (بنەڕەت: له *ektomē* یونانی‌یەوه "excision") ◌ پسوند: - برداری، قطع

**ectoparasite** /ˌɛktəʊ'parəsʌɪt/ *noun*

(زیندەناسی) دەرەمشەخۆر، مشەخۆری دەرەوه یان دەرەژی (وەکوو کێچ، بڕوانه endoparasite) ◌ انگل بیرونی

**ectoparasitic** *adjective*

سەربه دەرەمشەخۆر یان مشەخۆری دەرەوه، پێوەندی به دەرەمشەخۆرەوه هەیه ◌ وابسته به انگل بیرونی

**ectopic** /ɛk'tɒpɪk/ *adjective*

(پزشکی) له شوێنی نائاسایی‌دا، نه له جێی خۆی ◌ اکتوپیک

**ectopic pregnancy** *noun*

سکپڕی نه له منداڵدانا، ب.ت. له Fallopian tube دا ◌ آبستنی اکتوپیک

**ectoplasm** /'ɛktəʊplæzəm, US 'ɛktoʊ-/ *noun*

1 دەرەپلازم، توێ یا توێژاڵی دەرەوەی سیتوپلاسم (بڕوانه endoplasm) 2 مادەیێ که دەوترێ له لەشی پێوەندی‌گر medium دێتەدەرێ و دەبێتەهۆی کەوتنه بەرچاوی رۆحەکه ◌ 1 اکتوپلاسم 2 جسم اثیری

**ectoplasmic** *adjective*

سەربه دەرەپلازم یان ئێکتوپلازم ◌ وابسته به اکتوپلاسم

**ectoproct** = bryozoan

**Ectoprocta** /ˌɛktə(ʊ)'prɒktə/ *pl.* = Bryozoa

**ectosome** *noun*

(زیندەناسی) دەرەلەش: توێی دەرەوەیی و پێستەیی ئیسفەنجێ ◌ اکتوزوم

**ectotherm** /'ɛktəʊθəːm/ *noun*

(گیانەوەرناسی) دەرەگەرم، ئاژەڵێ که بەنده به سەرچاوه دەرەکی‌یەکانی گەرمی لەشەوه ◌ اکتوترم

**ectothermic** *adjective*

سەربه دەرەگەرم ◌ وابسته به اکتوترم

**ectotrophic** *adjective*

(زیندەناسی، دەربارەی mycorrhiza ی) لەسەر رووی ریشەی بەشدار شین دەبێ، ئەو دەمەی کارگ له دەرەوەی ریشەدا بێ (بڕوانه endotrophic) ◌ اکتوتروفیک

**ectypal** *adjective*

سەربه یان پێوەندی به ئێکتایپەوه هەیه ◌ وابسته به کپی یا تکثیر

**ectype** *noun*

کۆپی، لەبەرهەڵگرتنەوه، لێ‌هەڵگرتنەوه، لەبەرنووسینەوه، روونووس‌هەڵگرتنەوه ◌ کپی، تکثیر

**ECU** /'ɛkjuː, 'iː-, 'eɪ-, -kuː/ *abbreviation* European Currency Unit, also ecu, *pl.* ecus

ئیکیو (یەکەی پارەی یەکێتی ئەورووپا (له ساڵی 1999 یورۆ جێگای گرتەوه) ◌ اکیو

**Ecuadorian** /ɛkwa'dɔːrɪən, Spanish

ekwaˈðoriən/ *noun, adjective,* also Ecuadorian
*n* خەڵــــکی ئیکـــوادۆر، ئیکـــوادۆری *adj* ئیکوادۆری ◌ اکوادوری
**ecumenical** /ˌiːkjuːˈmenɪkl, US ˌekjuː-/ *adjective*
سەربە کلیسەی جیهانی یا یەکیتی کلیسەکان ◌ وابسته به کلیسای جهانی
**ecumenially** /ˌiːkjuːˈmenɪkli, US ˌekjuː-/ *adverb*
یەکیتی‌خوازانە (کلیسە) ◌ وحدت‌گرایانە
**Ecumenical Patriarch** *noun*
ســــەرناوی گەورەقەشـــەی ئۆرتۆدۆکــــــی Constantinople ◌ لقب اسقف اعظم ارتدکس استانبول
**ecumenism** /ɪˈkjuːmənɪzəm/ *noun,* also -menicalism or ecumenicism
یــەکیتی‌خــوازی (کلیــسەیی)، یــەکیتی‌بــاوەڕی کلیسەیی ◌ وحدت‌گرایی
**eczema** /ˈeksɪmə, US ɪgˈziːmə/ *noun*
بیرۆ، گەزنە، سەودا (بنەڕەت: لاتینی نوێ، لە *ekzema* یۆنانی، لە *ekzein* "هەڵچوون و رژان، هەڵگیرسان break out ،boil over") ◌ اگزما
**eczematous** /ekˈziːmətəs, US ekˈzem-/ *adjective*
بیرۆدەرکردوو، گەزنەک ◌ مبتلا به اگزما
**-ed**[1] *suffix*
پاشــگر: 1 ئاوەڵـناو دروسـت دەکـا (دەلکێ بـە ناوەوە)، خاوەنی، دار، وەر، بە، مەند: *talented*
2 ئەو دەستەوشانە ساز دەکا کە لە ناو و ئاوەڵناو پێکهاتوون: *bad-tempered* (لە *-ede* ئینگلیـسی کۆنەوە) ◌ پسوند: 1 سازندەی صفت از اسم، دارای 2 عباراتی که از اسم و صفت ساخته شده‌اند
**-ed**[2] *suffix*
پاشــگر: نیـشانەی سـەردەمی رابـردوو و نـاوی بەرکار: *landed* (بنەڕەت: لە *-ed, -ad, -od* ئینگلیـسی کۆنەوە) ◌ پسوند: علامت زمان گذشته و اسم مفعول
**ed** *abbreviation* 1 edited 2 edition 3 editor 4 educated
**edacious** /ɪˈdeɪʃəs/ *adjective*
(دەگمەن) زۆرخۆر، voracious ◌ پرخور
**edacity** /ɪˈdæsəti/ *noun*
زۆرخۆری ◌ پرخوری
**Edam** /ˈiːdæm/ *noun*
ئیدام (= جۆرێ پەنیری رەقی خڕی Edamی هولەندی) ◌ ادام
**edaphic** /ɪˈdafɪk/ *adjective*
(زینگەناسی) خاکی، خۆڵی، گڵی، لە خۆڵـەوە هاتۆتەبەرهەم یان کاری تێ‌کراوە (هـەتا ئـاو و هەوا؛ edaphically *adv*) ◌ خاکی

**Edda** /ˈɛdə/ *noun*
هەریەک لەو دوو کتێبی ئایسلەندی سەدەی سێزدەیەم، th Elder یان Poetic Edda (کۆمەڵە هۆنراوەی نۆرسی کۆن لەبارەی ئەفسانەکانی نـۆرس) و the Younger یـان Prose Edda (دەس‌نووسێکی هۆنراوەی ئایسلەندی؛ بنەڕەت: هـەردووکیـان لـە نـاوی کـەسـایەتیێـک لـە هەڵبەستی *Rigsthul* نۆرسی کۆن یان لە *óthr* نۆرسی کۆن بە واتای "هۆنراوە poetry") ◌ ادا
**Eddic** *adjective*
ئێدیک، سەربە Edda ◌ ادیک، وابسته به ادا
**eddy** /ˈedi/ *noun, pl.* eddies
1 گێژەڵوکە، گەردەلوول، تەنوورە، باروفە، گەرینەک، زڤیرک، 2 whirlpool گێژاو، تەمباف ◌ 1 گردباد 2 گرداب
**edelweiss** /ˈeɪd(ə)lvʌɪs/ *noun*
(ئەڵمانی) رووەکێکی چیایی [ *Leontopodium alpinum*] ◌ نوعی گیاه
**edema** *noun,* US spelling of oedema
(edematous *adj*) dropsy، پەنمیان، ئاوبەند ◌ ورم، آب‌آوردگی
**Eden** /ˈiːdn/ *noun,* the Garden of Eden
باغی عەدەن یا عەدن (باخێ کە بەپێی Genesis ئادەم و حەوا هەوەڵجار لەوێ ژیاون)، بەهەشت، بەختەوەری ◌ باغ عدن، بهشت، سعادت
**Edenic** *adjective*
سەربە باغی عەدەن یا عەدن ◌ وابسته به باغ عدن
**Edentata** *noun, pl.*
بێ‌کەڵبەکان ◌ ادنتاتا
**edentate** /ˈiːdənteɪt/ *noun, adjective*
*n* گیانەوەری بێ‌کەڵبە: شیردەر یـان گـوانداری دەسـتەیـێ کـە نـە کەڵـبە canine و دانی پێـش incisor یان نییە و بریتین لە: sloth ،anteater و armadillo [دەسـتـە Xenarthra (یـــان Edentata)] *adj* بـێ‌کەڵـبە (بنـەڕەت: لـە *edentat-* ،*edentare* لاتین "بێ‌ددان کردن") ◌ ادنتیت
**edentulous** /ɪˈdentjʊləs/ *adjective*
(پزشکی و گیانەوەرناسی) بێ‌ددان، دەم‌پووچ ◌ بی‌دندان
**edge** /edʒ/ *noun*
1 لێوار، دەم، کەنار، لێفک، لێو، داوێن، پاڵ، گوێ، دەم، قەراغ: *He stood on the edge of the cliff* 2 ساو، تیژایی، بەری تیژ(ا)یی: *Be careful—it has a sharp edge* 3 پەراوێز، زێوار 4 رادە، سـنوور 5 کاریگەری ◌ 1 لبه، پهلو، کنار 2 تیزی 3 حاشیه 4 مرز، حد 5 نفوذ
**edged** *adjective*
1 لێواردار، پەراوێزدار، زێواردار: *rough-edged* 2 ـلێوار، ـدەمە، ـدەم، ـدەم، برا، تیژ: *two-ged an edged knife* ◌ 1 لبه‌دار، حاشیه‌دار 2 ـلبه

**edge tool** *noun*, also edged tool
ئامێر یان ئامرازی تیژ (وەک ئەسکەنە) ◌ ابزار تیز

**edgeless** *adjective*
بێدەم، بێلێو، بێلێوار، کول ◌ بدون لبه، بی‌دم

**edgeways** /ˈedʒweɪz/ *adverb*, also edgewise /-waɪz/
لە لێوارەوە، لە لاوە، لە پاڵەوە، لارەولار، sideways ◌ از کنار

**edgily** /ˈedʒili/ *adverb*
بە شێوەیەکی زووتێکچوو، نارەحەتانە ◌ به طور عصبی

**edginess** /ˈedʒinəs/ *noun*
زووتێکچوویی، نارەحەتی، نگەرانی: *I did not, at the time, know the reason for his edginess* ◌ نگرانی، عصبانیت

**edging** /ˈedʒɪŋ/ *noun*
پەراوێز، زێوار، پەراوێزلێنان، پەراوێزدانان، لێولێنان، لێوارنانەوە ◌ حاشیه، لبه‌زنی

**edgy** /ˈedʒi/ *adjective* (edgier, edgiest)
1 زووتێکچوو، نارەحەت، شڵەژاو، فیشەکی، جینگڕی، نگەران 2 تیژ 3 لێواردار، بەلێوار ◌ 1 عصبی، آتشی 2 تیز 3 لبه‌دار

**edh** /ɛð/ = eth

**Ediacarian** *adjective, noun*
ئێدیاکارایی، ئێدیاکاریەن: سەربە کۆمەڵێ لە زیندەوەرە دەریاییە فرەخانەییەکانی دواییەکانی سەردەمانی Precambrian (لە تەپەکانی Ediacaraی باشووری ئەوسترالیا) ◌ ادیاکارین

**edibility** /ˌedəˈbɪləti/ *noun*, also edibleness /ˈedəb(ə)lnəs/
لەخواردنهاتوویی ◌ قابلیت خوردن

**edible** /ˈedəbl/ *adjective*
خۆراکی، لەخواردنهاتوو، خواردەنی، دەخورێ ◌ قابل خوردن

**edible dormouse** = fat dormouse

**edict** /ˈiːdɪkt/ *noun*
(فەرمی) بڕیار، فەرموار، دەستوور، فەرمان، *The festival was banned by* :decree *royal edict* ◌ حکم، دستور

**edictal** /ɪˈdɪkt(ə)l/ *adjective*
سەربە بڕیار، دەستووری، سەربە فەرمان ◌ وابسته به حکم یا دستور

**edification** /ˌedɪfɪˈkeɪʃn/ *noun*
1 فێری ڕەوشتی جوان کردن، ڕۆشنکردن، ڕووناکبیرکردن، بردنەسەرەوەی ئاستی مانایی یان مەعنەوی، ڕاهێنان، ڕەوشتدادان، پەروەردە 2 دەزگا، خانووبەرە ◌ 1 تهذیب، تربیت 2 ساختمان

**edificatory** /ɪˈdɪfəkətəʊrɪ/ *adjective*
ئێدیفیکاتۆری ◌ تهذیب‌کننده

**edifice** /ˈedɪfɪs/ *noun*
1 دەزگا، بینا، خانووبەرە (ب.ت. گەورە) 2 سیستمی ئاڵۆزی بیروباوەڕ ◌ 1 عمارت، ساختمان 2 نظام پیچیده‌ی اعتقادات

**edifying** /ˈedɪfaɪɪŋ/ *adjective*
(فەرمی و بە شۆخی) فێرکەر، ڕەوشتدادەر، پەروەردەکەر ◌ تهذیب‌کننده

**edifyingly** /ˈedɪfaɪɪŋli/ *adverb*
فێرکەرانە، ڕەوشتدادەرانە، پەروەردەکەرانە ◌ به طور تهذیب‌کننده

**edit** /ˈedɪt/ *noun*
پیاچوونەوە ◌ ویرایش

**editable** /ˈedɪtəbl/ *adjective*
شیاوی پیاچوونەوە، لەپیاچوونەوەهاتوو: *an -e document* ◌ قابل ویرایش

**edited** *adjective*
چاوپیاخشاو، پیاچوواو، پێداچووەوە ◌ ویرایش‌شده، تدوین‌شده

**editing** *noun*
پیاچوونەوە، پێداچوون، بەسەرداچوون ◌ ویرایش

**edition** /ɪˈdɪʃn/ *noun*
1 چاپ، بڵاوبوونەوە، وەشان: *a paperback/hardback edition* 2 پیاچوونەوە، چاوپیاخشاندنەوە، بەسەرداچوون 3 ڕۆژنامە، کۆڤار و هتد 4 تیراژ 5 بەش، ئاڵقە، پشک، بەرنامە (فیلمی سێریال) ◌ 1 چاپ، طبع، نشر 2 ویرایش 3 روزنامه، مجله و... 4 تیراژ 5 قسمت

**editio princeps** /ɪˌdɪʃɪəʊ ˈprɪnsɛps/ *noun*, *pl.* editiones principes /ɪˌdɪʃɪˌəʊniːz ˈprɪnsɪpiːz/
یەکەمین چاپی کتێب ◌ نخستین چاپ کتاب

**editor** /ˈedɪtə(r)/ *noun*
1 سەرنووسەر: *the -itor of the Washington Post* 2 بەرپرسی 3 پێداچوونکار، پیاچوونەوان 4 مۆنتاژگەر 5 بەڕێوەبەری ڕۆژنامە یان کۆڤار ◌ 1 سردبیر 2 مسؤل 3 ویراستار 4 تدوین‌گر 5 مدیر روزنامه یا مجله

**editorial** /ˌedɪˈtɔːriəl/ *noun, adjective*
*n* سەروتار، سەرنڤیسار *adj* 1 سەرنووسەرانە، سەرنووسەری، سەربە سەرنووسەر: *the magazine's editorial staff* 2 پیاچوونەوەیی: *an editorial decision* ◌ *n* سرمقاله *adj* 1 وابسته به سردبیر 2 ویرایشی

**editorially** *adverb*
لە بواری سەرنووسەرییەوە، لە سەروتاردا ◌ از نظر سردبیری، در سرمقاله

**editorship** *noun*
سەرنووسەری: *the editorship of 'The Times'* ◌ سردبیری

**editress** *noun*, also editrix
(کۆن و بە شۆخی) editor = (زن) editor = ◌

(زن)

**Edo** /ˈɛdəʊ/ *noun*, *pl.* same or Edos
1 ئەندامی گەلێکی دانیشتووی ناوچەی Benin لە نایجیریا 2 زمانی Benue-Congoی ئەو گەلە ◌ ادو

**EDP** *abbreviation* electronic data processing
لێکدانەوەی زانیاری کامپیوتێر ◌ ای‌دی‌پی (داده‌پردازی کامپیوتری)

**EDT** *abbreviation* Eastern Daylight Time
(لە ئەمریکا) ئی‌دی‌تی ◌ ای‌دی‌تی

**EDTA** *noun*
(کیمیا) جۆری ترشەڵۆکی کریستالی $C_{10}H_{16}N_2O_8$ کە ب.ت. وەک کارایێکی chelate (ئاوێتەبوون لەگەڵ کانزاکان، بە شێوەیێ کە ئالقەیێکی دووهاوهێزی لە ناوەندی گەردیلەدا پێکبێ) بەکاردێترا، لە پزشکیدا وەک anticoagulant و بۆ چارەسەری ژاراویبوون بە سورب بەکاردێترا، ترشەڵۆکی ethylenediamine tetra-acetic ◌ ای‌دی‌تی‌ای

**educability** /ˌedʒʊkəˈbɪləti/ *noun*
لەپەروەردەهاتوویی ◌ تربیت‌پذیری

**educable** /ˈedʒʊkəbl/ *adjective*
لەپەروەردەهاتوو، پەروەردە دەکرێ، فێر دەبێ ◌ تربیت‌پذیر

**educated** /ˈedʒukeɪtɪd/ *adjective*
1 خوێندەوار، رۆشنبیر، رووناکبیر: *an -ucated and articulate person* 2 پەروەردەکراو، بەکەماڵ ◌ 1 تحصیل‌کرده، فرهیخته 2 تربیت‌شده

**educated guess** *noun*
گومان یان مەزندەی لە راستی نزیک ◌ حدس قریب به یقین

**education** /ˌedʒuˈkeɪʃn/ *noun*
1 پەروەردە، فێرکاری، فێربوون، راهێنان، ئامۆژ 2 خوێندن، وانەدانەوە، وانە (دەرس)وتنەوە 3 رۆشنبیری، رووناکبیری، فەرهەنگ ◌ 1 آموزش و پرورش، آموزش، تربیت 2 تحصیل، تدریس 3 فرهنگ

**educational** /ˌedʒuˈkeɪʃənl/ *adjective*
1 فێرکاری‌یانە، فێرکەر 2 پەروەردەیی 3 سەربە خوێندن ◌ 1 آموزشی 2 وابسته به آموزش و پرورش 3 تحصیلی

**educational institutions** *noun*, *pl.*
دەزگاکانی پەروەردە یان فێرکاری ◌ مؤسسات آموزشی

**educationally** /-ʃənəli/ *adverb*
لەباری فێرکاری‌یەوە ◌ از لحاظ آموزشی

**educationist** /ˌedʒuˈkeɪʃənɪst/ *noun*, also educationalist /ˌedʒuˈkeɪʃənəlɪst/
شارەزای پەروەردە، پەروەردەوان ◌ کارشناس آموزش و پرورش

**educative** /ˈedjukətɪv/ *adjective*
پەروەردەیی، فێرکاری‌یانە، فێرکەر، بەسوود، بەکەڵک، :instructive *an educative experience* ◌ تربیتی، آموزشی، آموزنده

**educator** /ˈedʒukeɪtə(r)/ *noun*, also educationist
راهێنەر، پەروەردەوان، پەروەردەگەر، مامۆستا، فێرگەر ◌ مربی، معلم، آموزگار

**educible** /ɪˈdjuːsəbl/ *adjective*
شیاوی هەڵێنجان یان ئەنجامگیری ◌ قابل استنتاج یا استنباط

**educt** /ˈiːdʌkt/ *noun*
هەڵێنجان، (لێ) هەڵکراندن، هەڵگوێستن، ئەنجام ◌ استنباط، نتیجه

**eduction** /ɪˈdʌkʃən/ *noun*
هەڵێنجان، (لێ) هەڵکراندن، هەڵگوێستن، لێ‌دەرهێنان، بۆدەرکەوتن، ئەنجامگیری ◌ استنباط، استنتاج

**eductor** *noun*
ئەنجامگیر، هەڵێنجێن ◌ استنباط‌کننده

**edutainment** /ˌedjuˈteɪnmənt/ *noun*
ئیدیۆتەینمێنت (ئەو بەرهەمانەی وەکوو کتێب، بەرنامەی تەلەفزیۆنی و ب.ت. بەرنامەی کامپیوتێری کە هەم لایەنی فێرکاری هەیە و هەمیش سەرقاڵکردن) ◌ ایدیوتینمنت

**Edw.** *abbreviation* Edward

**Edwardian** /edˈwɔːdiən, US -ˈwɔːrd-/ *adjective*, *noun*
*adj* (سەربە) قۆناخ یان سەردەم یان دەسەلاتی ئێدواردی حەوتەم Edward VII (1901.1910) *n* هاوچەرخی ئێدواردی حەوتەم ◌ *adj* (وابسته به) دوره‌ی هفتم *n* معاصر ادوارد هفتم

**-ee** *suffix*
پاشگر: 1 وەرگر، کەر، بکەر، کراو، ــوو، ــە: *employee, addressee, appointee, grantee* 2 ئاماژە بە شتێ کە تا رادەیێ چکۆلەیە: *bootee* 3 کەسێ کە شێوەی شتێ دەدا یان شتێ وەبیر دەخاتەوە: *goatee* 4 کەسێ بەشداری شتێکی کردووە: *returnee, refugee, absentee* (بنەڕەت: لە *-é* فەرەنسی ئەنگلۆنۆرمانەوە Anglo-Norman لە *-atus* لاتین) ◌ پسوند: 1 دریافت‌کننده، کننده، شده 2 اشاره به چیزی نسبتاً کوچک 3 کسی که شبیه به چیزی است یا چیزی را متداعی می‌سازد 4 شریک

**EEC** *abbreviation* European Economic Community
ئی‌ئی‌سی (کۆمەڵ(ە)ی ئابووری ئەوروپا، بازاڕی هاوبەش(ئەوروپا) ◌ جامعه‌ی اقتصادی اروپا

**EEG** *abbreviation* electroencephalogram
ئی‌ئی‌جی، باریکەی مێشک(ی)، (تاقی‌کاری یان تێستێکی پزشکی کە چالاکی ئێلێکتریکی لە مێشکدا تۆمار دەکا) ◌ ای‌ای‌جی

**eejit** /'i:dʒɪt/ = informal Irish and Scottish form of idiot

**eel** /i:l/ *noun*

مارماسی، ماراقی (خۆراکین، } ***Anguilla anguilla*** (ئەورووپا) و جۆرە پێوەندیدارەکان، دەستە [Anguilliformes]) ⬡ مارماهی

**eelgrass** *noun*

1 جۆرێ گیای دەریایی گەلابەنۆکەیی [*Zostera marina*] 2 جۆرێ گیای ئاوی گەلاباریک [توخم *Valisneria*] ⬡ نوعی گیاه

**eel-like** *adjective*

مارماسیئاسا، وەک ماراقی ⬡ مارماهیمانند

**eelpout** /'i:lpaʊt/ *noun*

جۆرێ ماسیی دەریایی سەرپانی چکۆلە [خێزانی Zoarcidae: گەلێ جۆرن] ⬡ نوعی ماهی

**eelworm** /'i:lwɜ:m/ *noun*

جۆرێ کرمی نیماتود nematode، ب.ت. هی نێو گڵ ⬡ نوعی کرم

**-een**[1] *suffix*

پاشگر: شێوە: *velveteen* (بنەڕەت: ڕەنگە لە ratteen وەرگیرابێ) ⬡ پسوند: شبیه

**-een**[2] *suffix*

پاشگر: (ناوی چکۆلێنراوی ساز دەکا) لاسایی: *colleen* (بنەڕەت: لە *-in* پاشگری چکۆلاندنی ئیرلەندی) ⬡ پسوند: تقلید

**eensy** /'i:nsi/ *adjective*, also eensy-weensy = informal tiny

**e'en** /i:n/ = poetic/literary form of even

**e'er** /e:/ = poetic/literary form of ever

**-eer** *suffix*

پاشگر: 1 (ناو ساز دەکا، لە بنەڕەتدا لەو وشەقەرزانەی کە لە فەرەنسییەوە وەرگیراون) ئاماژە بە کەسێ کە بە کار و چالاکییێکەوە خەریکە (لە کوردیدا پاشگرەکانی وان، هەڵگەر، چی، کار، یار، نووس، نشین و هتد دەتوانن لە بری ئەم پاشگرە بەکاربێنرێن): *auctioneer*، *engineer*، *mountaineer*، *pamphleteer*، *buccaneer*، *mutineer*، *pioneer* (زۆرتر لەو وشانەی کە واتاێکی سووکانەیان هەیە: *profiteer*) 2 (کار ساز دەکا) ئاماژە بە خەریکبوون بە کار یا چالاکییێکەوە: *electioneer* (بنەڕەت: لە *-ier* فەرەنسی، لە *-arius* لاتین) ⬡ پسوند: 1 اسمساز 2 فعلساز

**eerie** /'ɪəri, US 'ɪri/ *adjective* (eerier, eeriest)

ترسێنەر، ترسناک، سەیر، strange، frightening ⬡ ترسآور، مخوف، شگفتانگیز

**eerily** /'ɪərəli, US 'ɪr-/ *adverb*

ترسناکانە، ترسێنەرانە ⬡ به طور خوفانگیزی

**eeriness** *noun*

ترسناکی، ترسێنەربوون، ترسێنەری ⬡ هراسناکی، خوفانگیزی

**ef** *noun*

پیتی ئێف، فێ ⬡ اف

**ef-** *prefix*

پێشگر: ئەرک و ڕۆڵی ex-[1] دەگێڕێ ⬡ پیشوند: با نقش -ex

**EFA** *abbreviation* essential fatty acid

**effable** /'ɛfəb(ə)l/ *adjective*

لە باس دێ، بە وشە دەردەبڕێ ⬡ وصفپذیر

**effaceable** /ɪ'feɪsəbl/ *adjective*

لەسڕینەوەهاتوو، دەسڕێتەوە، لادەچێ، پاک دەبێتەوە ⬡ محوشدنی

**effacement** *noun*

سڕانەوە، پاک(ک)بوونەوە، کوژانەوە، کوێرکردنەوە، پاکتاوبوون، لابردن، سڕینەوە، شۆردنەوە، پاکردنەوە، نەهێشتن ⬡ محو، امحا

**effect** /ɪ'fekt/ *noun*

1 کاریگەری، کارتێکردن، کار، شوێندانان، باندۆر 2 ئەنجام، پێشاژۆ، ئاکام 3 هۆکرد (لە بەرامبەر هۆ cause دا) 4 واتا، چەمک، نێوەڕۆک، کاکڵ، کرۆک 5 ئیفێکت 6 (effects) شتومەک، کەلوپەل، بارگەوبنە، ئەسباب ⬡ 1 اثر، تأثیر 2 پیامد، نتیجه 3 معلول 4 معنی، محتوا، مفهوم 5 جلوه 6 (در جمع) اثاثیه، اسباب

**effective** /ɪ'fektɪv/ *adjective, noun*

*adj* 1 کاریگەر، کارلێکەر، یەکاویەک، کارا، کارتێکەر، شوێندانەر، بەباندۆر 2 کاری، بەئەنجام، کاریگەر، ئەنجامدەرەوە 3 بەرچاو، سەرنجڕاکێش، بالکێش 4 ڕاستەقینە، واقعی، هەیی، کردارەکی، بەکردەوە 5 پڕئیفێکت 6 کاری، گونجاو بۆ کار 7 جێبەجێکراو (قانوون) *n* سەربازی ئامادە بۆ خزمەت ⬡ *adj* 1 مؤثر، تأثیرگذار 2 نتیجهبخش 3 جالب 4 واقعی، عملی 5 جلوهدار 6 کارآمد 7 مُجرا (قانون) *n* افکتیو

**effective charge** *noun*

بارگەی کاری(گەر)، بارگەی کارتێکەر، باری کارتێکەر ⬡ بار مؤثر

**effective collision** *noun*

بەریەککەوتن یا لێککەوتنی کاریگەر یا کارتێکەر ⬡ برخورد مؤثر

**effective current** *noun*

لێشاوی کاریگەر، تەوژمی کاریگەر، تەزووی کاریگەر یان کارتێکەر ⬡ جریان مؤثر

**effectively** /ɪ'fektɪvli/ *adverb*

کاریگەرانە، بە شێوەیەکی کارا؛ virtually ⬡ به طور مؤثر

**effectiveness** *noun*, also less frequent effectivity /ˌɪfek'tɪvɪti/

کاریگەری، کارایی، کارتێکردن ⬡ تأثیرگذاری

**effectless** *adjective*

کارتێنەکەر، ناکاریگەر ⬡ بیاثر

**effector** /ɪˈfektə(r)/ *noun*
(زیندەناسی) کارتێکەر، کاریگەر: ئەندام یان خانەیێ کە لە بەرامبەر هاندەر یان بزوێنەرێ کاردانەوەی هەبێ ⬡ مؤثر

**effectual** /ɪˈfektʃuəl/ *adjective*
1 کاریگەر، کاری، کارا، بەکارهاتوو، بەئەنجام، ئەنجامدەرەوە 2 (ماف) بەبایەخ، باوەڕمەند ⬡ 1 مؤثر، ثمربخش 2 (حقوق) معتبر

**effectuality** /ɪˌfektʃuˈælɪti/ *noun*
کاریگەری، کارایی، بەکارهاتوویی، بەئەنجامی ⬡ اثر، ثمربخشی

**effectually** /ɪˈfektʃuəli/ *adverb*
بەشێوەیەکی کاری، کاریگەرانە ⬡ بە طور ثمربخشی

**effectuation** /ɪˌfektʃuˈeɪʃn *noun*
جێبەجێ(کردن)، کردن، ئەنجام ⬡ انجام

**effeminacy** /ɪˈfemɪnəsi/ *noun*
هەڵسوکەوتی ژنانە، ناریلەیی، ژنانیلەیی، ژناسایی، ژنانی ⬡ زنانگی

**effeminate** /ɪˈfemɪnət/ *adjective*
ژنانیلە، ناریلە، خلەکچانی، ژناسا، وەکوو ژنان ⬡ زنانە

**effeminately** /ɪˈfemɪnətli/ *adverb*
ژنانیلە، ناریلە، وەکوو ژنان ⬡ زنانە

**effendi** /ɛˈfɛndi/ *noun, pl.* effendis
ئەفەندی (بنەڕەت: لە ***authentēs*** یۆنانییەوە: گەورە، سەروەر) ⬡ افندی

**efferent** /ˈɛf(ə)r(ə)nt/ *adjective, noun*
*adj* دەربەران، نێرەر، راگوێزەر، هەڵگرە، هەڵگران *n* دەماری دەربەران یان هەڵگران (دژی **afferent**) ⬡ *adj* وابران *n* عصب وابران

**effervescence** /ˌefəˈvesns, US ˌefərˈv-/ *noun*
1 هەڵقولان، هەڵچوون، قلپە(کردن)، تۆقلەهەڵدان، کەفکردن، کوڵڕێژی، گازداربوون، فیشقەکردن، کوڵەکوڵ 2 تینوگوڕ، کەفوکوڵ، گڕوپف، جۆشوخرۆش ⬡ 1 جوشانبودن 2 جوش و خروش

**effervescent** /ˌefəˈvesnt, US ˌefərˈv-/ *adjective*
1 هەڵچوو، فیشقەکردوو، قلپن، بەکوڵهاتوو، قوڵتهەڵڕشتوو، کوڵڕێژ، کەفکردوو، هەڵقولاو، هەڵقوڵیو، گازدار 2 بەکوڵ، بەتینوگوڕ، بەجۆشوخرۆش ⬡ 1 جوشان 2 با شور و شوق

**effete** /ɪˈfiːt/ *adjective*
1 لاواز، پێچوو، بێهێز، بێگیان، سست، لەکارکەوتوو، پەککەوتوو، رزیو، بێبڕست: *an effete monarchy* 2 نەزۆک، ئەستێور، قسر (**effetely** *adv*) ⬡ 1 ضعیف، ازکارافتاده 2 نازا

**effeteness** *noun*
1 پێچوون، لاوازی، بێهێزی، بێگیانی، لەکارکەوتوویی، پەککەوتوویی، رزیوی 2 نەزۆکی، ئەستێوری، هەرکانی، لێژبوونەوە، تیاچوون ⬡ 1 ضعف، ازکارافتادگی 2 نازایی، زوال

**efficacious** /ˌefɪˈkeɪʃəs/ *adjective*
(فەرمی) کاری، یەکاویەک، بەئەنجام، کاریگەر، ئەنجامدەرەوە، بەسوود، باقازانج، بەکەڵک، *an efficacious remedy* :effective (**efficaciously** /ˌefɪˈkeɪʃəsli/ *adv*: کارییانە، بە شێوەیەکی کاریگەر، یەکاویەکانە، کاریگەرانە؛ **efficaciousness** *n*) ⬡ ثمربخش، مؤثر، نافع

**efficacy** /ˈefɪkəsi/ *noun,* also efficacity
کاریبوون، یەکاویەکی، کاریگەری، شوێندانەری، بەئەنجامی، ئەنجامدەرەوەیی، قازانج، کەڵک، سوود ⬡ تأثیر، ثمربخشی، فایده

**efficiency** /ɪˈfɪʃnsi/ *noun, pl.* efficiencies
1 لێوەشاوەیی، توانایی، بەکاری، کارایی، بەکارهاتوویی، هاتوویی، توانا‌داری 2 ئەنجامدانەوە، باشکارکردوویی، کاردانەوە، بەهرەدانەوە ⬡ 1 کفایت، لیاقت، قابلیت، استعداد 2 بازده

**efficiency expert** *noun,* also efficiency engineer
کەسێ کە شێوازەکان، رێباز و کارەکان شی دەکاتەوە تا زۆرترین کارایی لەباری پاراستنەوە بڕەخسێنێ ⬡ افیشنسی اکسپرت

**efficient** /ɪˈfɪʃnt/ *adjective*
1 لێوەشاو، بەکار، بەکارهاتوو، کارا، بەتوانا، بەدەس، لێهاتوو، زیهاتی، توانادار 2 کارا، نازا، کارناشنا، کارامە، بەرزەوەند، باشکارکردوو، کاریگەر، کاری، بەقازانج، بەسوود، بەبەهرە، بەکەڵک ⬡ 1 لایق، قابل، باکفایت، مستعد 2 کارآمد، مؤثر، سودمند

**efficient cause** *noun*
(فەلسەفە) هۆکار یا هۆی سەرەکی ⬡ علت اصلی

**efficiently** /ɪˈfɪʃntli/ *adverb*
1 باشتر 2 بە لێوەشاوەیی 3 کاریگەرانە ⬡ 1 بهتر 2 با لیاقت 3 به طور مؤثر

**effigy** /ˈefɪdʒi/ *noun, pl.* effigies
وێنە، کۆتەڵ، پەیکەر، بووکەڵە، پەڕۆیینە، داوەڵ (بنەڕەت: لە ***effigies*** لاتین، لە ***effingere*** "دارشتن، شێوەپێدان") ⬡ عکس، تمثال، صورت، مجسمه، آدمک

**effleurage** /ˌɛfləːˈrɑːʒ/ *noun*
جۆرێ شێلان یا مالشت **massage** کە بە لەپی دەست دەکرێ ⬡ افلوراژ

**efflorescence** /ˌefləˈresns/ *noun*
1 گوڵدەرکردن، خونچەدەرکردن، دەنووکەدان، چرۆدەرکردن، پشکوتن 2 ماوە یان سەردەمی پشکوتن 3 دۆکدەردان، گەردەهەڵدان، دۆک، دەوەک، گەرد ⬡ 1 شکوفایی 2 دورەی شکوفایی

3 شوره زدن، شوره
**efflorescent** /ˌeflə'resənt/ *adjective*
گـــوڵکـــردوو، خونچـــەدەکردوو، پـــشکوتوو، گوڵدەرکەر ۞ شکوفا
**effluence** /'efluəns/ *noun*
1 رۆیـین، دەرپـەڕین، هەڵقوڵـین، دەروەرِیـژی، گورِبوون 2 بڵاوبوونـەوە، پـەخشبوونـەوە ۞ 1 جریان، برونشارگی 2 انتشار
**effluent** /'efluənt/ *noun, adjective*
1 *adj* لقـەچۆم *n* 1 ئـاوەرِۆ، گەنـداو 2 گـلار، دەرپەڕیو، هەڵقوڵیو، دەروەرِیژ، گورِبوو 2 رۆیـو 3 بڵاوەبـوو، پەخـشەوەبوو ۞ *n* 1 فاضـلاب 2 شـاخەی فرعـی *adj* 1 بیـرونریزنـده 2 جـاری 3 منتشرشونده
**effluvium** /ɪ'flu:vɪəm/ *noun, pl.* effluvia /-vɪə/ or effluviums
1 گەندەهەڵم، گەندەهەڵمی نەبینراو 2 بۆخاو ۞ 1 بخار عفن. بخار غیرمرئی بدبو 2 هوای گرفته
**efflux** /'ɛflʌks/ *noun*
1 هەڵقوڵـــین، دەرپـــەڕین، دەروەرِیـــژی، هاتنـــەدەرەوە، دەر(ڕ)ژان، لێچـــوون، لێـــرژان، دەرچـــــــوون، گورِبـــــــوون، 2 effluence بەســـەرچوون، تێپـــەڕین، expiration ۞ 1 برونشارندگی 2 گذشتن، مرور زمان
**effluxion** /ɪ'flʌkʃ(ə)n/ *noun*
1 هەڵقوڵین، دەرپەڕین، دەروەرِیژی، دەر(ڕ)ژان، هاتنـەدەرەوە، دەرچـوون، گورِبـوون 2 (مـاف) بەسـەرچوون، تێپـەڕین ۞ 1 بـرونشـارندگی 2 گذشتن، مرور زمان
**effondrement** *noun*
تێکتەپین ۞ رمبش
**effort** /'efət, US 'efərt/ *noun*
1 حـەوڵ، ئـەرک، تەقـەلا، هـەوڵ، داکـۆکی، تێکۆشان، کۆشە، کۆشست، پەلە، خەبات، بزاڤ، ئەختوچار، کردوکۆش، زەحمەت، رەنج، کاری سـەخت، کـاری گـران 2 ئاکـامی تێکۆشـان. بەرهەم، ئەنجامی حەوڵ و تەقەلا ۞ 1 سـعی، کوشش. جدوجهد، کار سخت 2 نتیجەی تلاش
**effortless** /'efətləs, US 'efərt-/ *adjective*
بێئەرک، بێزەحمەت، بێگیرەوکێشە، خۆش، ئاسان، سانا، سادە، بێرەنج، ئاسوودە: *effortless power* ۞ بیزحمت، سهل، راحت
**effortlessly** /'efətləsli, US 'efərt-/ *adverb*
ئاسان، خۆش، بێئەرک ۞ راحت
**effortlessness** *noun*
ئاسـانی، سـانایی، بێئەرکی، خۆشی، بێئەرکی، بێزەحمەتی، ئاسوودەیی ۞ سهولت، راحتی
**effrontery** /ɪ'frʌntəri/ *noun, pl.* effronteries
رووداری، بێشەرمی، بێحەیایی، بێئابروویی، رووشـەیـی، رووهەڵماڵـراوی، insolence ۞

وقاحت، جسارت
**effulgence** /ɪ'fʌldʒəns/ *noun*
دەرەوشـــــانەوە، پرشـــــنگداری، چرســـــنی، رووناکیدانـــەوە، brilliance (effulgent /ɪ'fʌldʒənt/ *adj*: دەرەوشـاوە، پرشـنگدار، رووناکیدەرەوە؛ effulgently *adv*) ۞ تجلی، درخشش، تابندگی
**effusion** /ɪ'fju:ʒn/ *noun*
1 فیشقەکردن، هەڵقوڵین، کفە کردن، هەڵچوون، کوفارە، دەرپەڕین، رژان، سەرریژکردن، لێرژان، دەردان، لێهاتن، دانەدەرەوە 2 رژاوە، شتی رژاو، بری رژاو 3 هەڵرشتن، دەربرینی هەست و سۆز، دانەدەرەوەی کوڵوکۆ، هەڵچوون ۞ 1 فوران 2 شیء یا مقدار ریختەشده 3 ابراز احساسات
**effusive** /ɪ'fju:sɪv/ *adjective*
1 یـەکجار بەسـۆز، سـۆزدەربرانە 2 دەرپـەریو، ســـەرریژکردوو، دەروەرِیـــژ، هەڵقوڵـــیو، فیشقەکردوو ۞ 1 احساساتی 2 بیرونریزنده
**effusively** /ɪ'fju:sɪvli/ *adverb*
لە رادەبەدەر، لە ئەندازبەدەر ۞ بیش از اندازه
**effusiveness** /ɪ'fju:sɪvnəs/ *noun*
پەرگری، زێدەرەوی، پەرگیری ۞ افراط
**Efik** /'ɛfɪk/ *noun, pl.* same
1 ئەندامی گەلێکی نایجیریای باشووری 2 زمانی بێنوی-کۆنگۆیی Benue-Congo ئەو گەلە ۞ افیک
**e-fit** /'i:fɪt/ *noun,* also E-fit
ئیفیت (= وێنەی کەسێ کە پۆلیس بەدواوەیەتی) ۞ افیت
**EFL** /ˌi: ef 'el/ *abbreviation* English as a Foreign Language
زمانی ئینگلیسی بۆ بیانییەکان، زمانی ئینگلیسی وەکوو زمانێکی بیانی (بۆ ئەو کەسانە کە زمانی زگماکیان ئینگلیسی نییە) ۞ ایفل
**eft** /ɛft/ *noun*
1 قورناویلکە 2 newt (گیانەوەرناسی) قۆناخی بێچوویی قورناویلکە ۞ 1 سمندر آبی 2 مرحلەی بچگی سمندر آبی
**EFTA** /'eftə/ *abbreviation* also (Efta) European Free Trade Association
ئیفتـا (یـەکێتی کـارداری (بازرگـانی) ئـازادی ئەورووپا) ۞ افتا
**e.g.** /ˌi: 'dʒi:/ *abbreviation* also (eg, from *Latin*) exampli gratia
بۆ نموونە، بۆ وێنە، ژ بۆ میناک: *popular pets, e.g. cats and dogs* ۞ مثلاً، به عنوان مثال
**egad** /ɪ'gad/ *interjection,* also egads
بە خودا (سوێندێکی نەرمە، جوانەدەربری بۆ *oh God*) ۞ به خدا
**egalitarian** /iˌgælɪ'teəriən, US -'ter-/ *noun, adjective*

(کەسێکی) بەرامبەرخواز، بەرامبەرخوازانە: *He* ◊ *described himself as 'an egalitarian'* ⟡ *an -an society* (آدم) مساوات‌طلب، مساوات‌طلبانه

**egalitarianism** /iˌgælɪ'teərɪzəm/ *noun*
بەرامبەرخوازی، یەکسان‌خوازی، یەکسان‌باوەڕی ⟡ مساوات‌طلبی

**Egeria** *noun*, Latin
ئیجیریا: 1 پەری یان حوورییێ کە پادشای ئەفسانەیی ڕۆم Numa Pompilius ی ئامۆژگاری کرد 2 ژنێکی ئامۆژگار و شیرەتفان و هاوڕێی کەسێ ⟡ اجریا

**egestion** /'dʒesʃn/ *noun*
دەردان، دانەدەرەوە، خستنەدەر(ەوە؛ egestive (*adj* ⟡ دفع

**egg** /eg/ *noun*
1 (زیندەناسی) هێلکە، گەرا، زەبەقوون، خاهێک 2 (زیندەناسی) هێلکۆکە ovum، خانەی زاوزێی مێیینەی گیانەوەران و ڕووەکەکان 3 (بیناسازی) نەخشی هێلکەیی ⟡ 1 تخم، تخم‌مرغ 2 تخمک 3 ابزار بیضوی

**egg-and-anchor moulding** *noun*
(بیناسازی) نەخشی هێلکە و لەنگەر ⟡ ابزار بیضه لنگری

**egg-and-arrow moulding** *noun*, also egg-and-dart moulding or egg-and-tongue moulding
(بیناسازی) نەخشی هێلکە و تیر (یا زمانە و تیر) ⟡ ابزار بیضه پیکانی

**eggbeater** = egg-whisk

**eggcup** /'egkʌp/ *noun*
جێ‌هێلکە، کاسە یان قاپی هێلکە ⟡ جاتخم‌مرغی

**egghead** /'eghed/ *noun*
(نافەرمی) زانای بێ‌کردەوە، مرۆی ڕۆشنبیر یان بیریار (بێ‌کردەوە)، highbrow ،intellectual ⟡ عالم بی‌عمل، آدم روشن‌فکر

**egg-nog** *noun*, (Brit. also egg-flip)
جۆرێ خواردنەوە کە لە مەی یان ئەلکۆلێکی تر دروست دەبێ و لەگەڵ هێلکە (و شەکر و تووێ) و شیر لێک‌دەدرێ ⟡ اگ‌ناگ

**eggplant** /'egplɑːnt, US -plænt/ *noun*, also aubergine
1 باینجان، باینجانەڕەشە، باجانەڕەش، کەدووەڕەشە، 2 aubergine ڕەنگی ئەرخەوانی ڕەش ⟡ 1 بادنجان 2 رنگ ارغوانی سیاه

**egg roll** *noun*
جۆرێ ڕۆڵ کە لە هێلکە دروست دەبێ، ڕۆڵی هێلکەیی ⟡ اگ‌رول

**egg-shaped** /'egʃeɪpt/ *adjective*
هێلکەیی، شێوەهێلکە ⟡ بیضی

**eggshell** /'egʃel/ *noun, adjective*
*n* توێکڵە هێلکە، توێخڵە هێلکە *adj* ناسک، توێخڵە هێلکەیی، توێخ‌هێلکەیی ⟡ *n* پوست تخم‌مرغ *adj* پوست تخم‌مرغی

**eggshell china** *noun*
چینکۆی توێکڵە هێلکەیی یا ناسک ⟡ چینی پوست تخم‌مرغی

**egg-timer** *noun*
دزەگایێ بۆ ئەندازەگرتنی کات، وەختێ هێلکە دەکوڵێ، کات‌ژمێری لمی ⟡ ساعت شنی

**egg whisk** *noun*
هێلکەشڵەقێن، هێلکەلێکدەر ⟡ تخم‌مرغ‌زن

**egg white** *noun*
چەرمینە، سپێنی، سپیلک (هێلکە) ⟡ سفیده‌ی تخم‌مرغ

**eglantine** /'eglɔntaɪn/ *noun*, also sweetbriar

**EGM** *abbreviation* extraordinary general meeting
کۆبوونەوەی گشتی نائاسایی ⟡ گردهمایی عمومی غیرعادی (یا فوق‌العاده)

**ego** /'iːgəʊ, 'egəʊ, US 'iːgoʊ/ *noun*, *pl.* egos
1 خۆ، خود، من (ئەو بەشە لە هۆش یان مایند کە بەرپرسە بۆ هەست و ئەوەی کەوا هەی: بەپێی دەروونناسی فرۆید، لەگەڵ id و superego بەراوردی کە) 2 خۆبەرستی، خۆخوازی، خۆبینی، هەرخۆیی، خۆبێ‌زلی 3 ڕێزلەخۆنان، نرخ‌بۆخۆدانان (لە لاتینەوە بەواتای "من I") ⟡ 1 خود، من، نفس 2 خودخواهی، غرور 3 عزت نفس

**egocentric** /ˌegəʊ'sentrɪk, ˌiːg-, US ˌiːgoʊ-/ *adjective, noun*
(کەسێکی) خۆخواز، خۆبین، هەرخۆبین ⟡ (آدم) خودمحور

**egocentrically** /ˌegəʊ'sentrɪkli, ˌiːg-, US ˌiːgoʊ-/ *adverb*
خۆخوازانە، خۆبینانە، هەرخۆبینانە ⟡ خودمحورانه

**egocentricism** *noun*
خۆخوازی، خۆبینی، هەرخۆبینی ⟡ خودمحوری

**egocentricity** *noun*
خۆخوازی، خۆبینی، هەرخۆبینی ⟡ خودمحوری

**egoism** /'egəʊɪzəm, 'iːg-, US -goʊ-/ *noun*
1 تیۆرییێکی ئاکاری کە بەرژەوەندی خۆ وەک بنەمای مۆرالیتە دادەنێ 2 خۆخوازی، خۆویستی، خۆبینی، هەرخۆبینی، خۆپەسندی، خۆبەزل‌زانی، خۆپەرستی، خۆگەری ⟡ 1 اگوئیسم 2 خودخواهی، خودگرایی، تکبر، خودمداری

**egoist** /'egəʊɪst, 'iːg-, US 'iːgoʊ-/ *noun*
خۆخواز، خۆبین، هەرخۆبین، خۆپەسند، خۆپەرست، خۆگەر ⟡ خودخواه، خودگرا، خودمدار

**egoistic** /ˌegəʊˈɪstɪk, ˌiːg-, US -goʊ-/ *adjective*, also egoistical
خۆخــواز، خــۆبین، خۆویــست، خۆپەســند، خۆپەرســت، خۆخوازانــە (egoistically *adv*: خۆخوازانە) ◌ خودخواه، خودپسند، خودخواهانه

**egomania** /ˌegəʊˈmeɪniə, ˌiːgəʊ-, US ˌiːgoʊ-/ *noun*
ئیگۆمانیا ◌ خودشیدایی

**egomaniac** /ˌegəʊˈmeɪniæk, ˌiːgəʊ-, US ˌiːgoʊ-/ *noun*
ئیگۆمانیک، مرۆی خۆبین ◌ خودشیدا

**egotism** /ˈegətɪzəm, US ˈiːg-/ *noun*
خـۆبینی، خۆویـستی، خۆخـوازی، هـەرخۆبینی، خۆپەرســتی، خۆپەســندی، خۆهەڵکێــشان، منەمن‌کردن ◌ خودخواهی، خودپرستی، لاف‌زنی

**egotist** /ˈegətɪst, US ˈiːg-/ *noun*
خۆخواز، خۆبین، خۆویستی، خۆپەسند، مرۆی خۆهەڵــکێش، منــەمن‌کــەر ◌ خودخــواه، خودپرست، آدم لاف‌زن

**egotistic** /ˌegəˈtɪstɪk, US ˌiːgə-/ *adjective*, also egotistical /ˌegəˈtɪstɪkl, US ˌiːgə-/
خــۆبین، خۆویــست، خۆخــواز، لــەخۆرازی ◌ خودخواه

**egotistically** /-kli/ *adverb*
خۆبینانە، بە شێوەیەکی خۆبینی ◌ خودخواهانه

**ego trip** *noun*
خۆبینی، خۆخوازی، خۆنواندن ◌ خودخواهی

**egregious** /ɪˈgriːdʒiəs/ *adjective*
یەکجار خـراپ، زەق، بـەرچاو، لێ‌نـەبووراو ◌ فاحش، فوق‌العاده بد

**egregiously** *adverb*
یــەکجار خــراپ، بــە تــەواوەتی، زەقانــە، لێ‌نەبووراوانە (egregiousness *n*) ◌ بـە طـور فاحش، فوق‌العاده بد

**egress** /ˈiːgres/ *noun*
1 چوونــەدەرێ، دەرکــەوتن، هاتنــەدەرێ، دەرچــوون 2 مـافی چوونەدەرێ، دەرچە، درگا، ڕێگای چوونەدەرەوە ◌ 1 خروج 2 حق خـروج، انبثاق، مخرج

**egression** /ɪˈgreʃən/ *noun*
چوونەدەرێ، هاتنەدەرەوە ◌ خروج

**egret** /ˈiːgrət/ *noun*
(گیانەوەرناسی) سۆرەویلک، خەمەخۆرە، شـاف [تو خمەکانی *Egretta* (و *Bubulcus*): چەندین جۆرن] ◌ حواصیل

**Egyptian** /ɪˈdʒɪpʃn/ *adjective, noun*
*adj* سەربە میسر *n* 1 میسری، خەڵکی میـسر 2 زمـانی ئافرۆـئاسـیاتیکی میـسری کـۆن ◌ *adj* وابسته به مصر *n* 1 اهل مصر 2 زبان باستانی مصری

**Egyptian cobra** *noun*
کوبرای میسری [*Naja haje*] ◌ کبرای مصری

**Egyptian alfalfa weevil** *noun*
ئەسپێی کـەت (یـان وێنجە)ی میـسری: جـۆرێ ئەسپێ یـان کێچوولەی دنیـای کـۆن کـە ئێـستا بەلای وێنجەیە لە ڕۆژاوای ئەمریکای بـاکووری [*Hypera brunneipennis*] ◌ نوعی شپشک

**Egyptian clover** = berseem

**Egyptian cotton** *noun*
کەتانی میسری، لۆکەمیـسری (زۆرتر لـە میـسر شین دەبێ) ◌ نوعی کتان

**Egyptology** /ˌiːdʒɪpˈtɒlədʒi, US -ˈtɑːl-/ *noun*
میــــــسرناسی (Egyptological *adj*؛ Egyptologist /ˌiːdʒɪpˈtɒlədʒɪst, US -ˈtɑːl-/ *n*: میــسرناس، زانــای شــوێنەوارە میـسرییەکان) ◌ مصرشناسی

**eh** /eɪ/ *interjection*, US usually huh
ها! چی! مەگەر نا، مەگین نە ◌ هان! مگر نه

**EHF** = extremely high frequency

**ehrlichiosis** *noun*
نەخـوش‌کـەوتن بـەهـۆی بـەکتریـا ڕیکێتـسیە rickettsial گەنەراگوێزەکان [توخم *Ehrlichia* (لە ناوی Paul *Ehrlich*ـەوە)] ◌ ارلیکیوز

**eicosanoid** *noun*
دەســتەیێ لـە ئاوێتـەکـان (وەک prostaglandinـەکان) کە لە ترشەلۆکە چەورییە تێرنەبووەکـان (وەک arachidonic acid) بـەرهـەم هـاتوون و گلاونەتە چالاکی خانەیی cellular activity ◌ ایکوسانوئید

**eicosapentaenoic acid** /ˌʌɪkɒsəˌpentiːˈnəʊɪk/ *noun, abbreviation* EPA
(کیمیــا) ترشەڵــۆکی بیــستپێنجینــە یــان ئایکۆساپێنتینۆیک (زۆرتر لە ڕۆنی ماسیدا، لە یۆنــانیـیــەوە *eicosa*- "بیــست" (ژمــارەی گەردیلەکانی کاربۆن لە گەردیکا) + penta- "پێنج" (ژمارەی بەند یان پێوەستە ناپاراوەکاندا) + -*oic* + -ene) ◌ اسید ایکوساپنتیونیک

**Eid** /iːd/ *noun*, also Id
1 (بـە تـەواوی Eid ul-Fitr /ˌiːdʊlˈfɪtrə/) جەژنی ڕەمەزان 2 (بە تەواوی Eid ul-Adha /ˌiːdʊlˈɑːdə/) جەژنی قوربان ◌ 1 عیـد فطـر 2 عید قربان

**eiderdown** /ˈaɪdədaʊn, US -dərd-/ *noun*
لێفەی پەڕ، لێفە ◌ لحاف پر

**eidolon** /ʌɪˈdəʊlɒn/ *noun, pl.* eidolons or eidola /-lə/
تارمایی، سەهوێر، سێتاف، سوێس، تابۆ ◌ شبح

**eight** /eɪt/ cardinal number *adjective, noun*
*adj* هەشــــت (دانــە) *n* 1 ژمــارەی هەشــت، ڕەنووسی هەشـت 2 ماشێنی هەشـت سیلێندر 3 دەستەیەکی هەشـت‌کەسی (بەلەم‌سواری) ◌ *adj*

هشت n 1 عدد هشت 2 اتومبیل هشت سیلندر 3 گروه هشت نفری

**eighteen** /ˌeɪˈtiːn/ cardinal number *adjective, noun*

*adj* هەژدە n ژمارەی هەژدە، ڕەنووسی هەژدە ◌ *adj* هیجده n عدد هیجده

**eighteenth** /ˌeɪˈtiːnθ/ ordinal number *noun, adjective*

n هەژدەیەک *adj* هەژدەیەم، هەژدەیەمین ◌ n یک‌هیجدهم *adj* هیجدهم(ین)

**eighth** /eɪtθ/ ordinal number, *noun, adjective*

n هەشتیەک *adj* هەشتەم، هەشتەمین ◌ n یک‌هشتم *adj* هشتم(ین)

**the Eighth Army** *noun*

ئەرتەش یان سپای هەشتەم: لقێ لە سپای بریتانیا کە بە درێژایی شەڕی جیهانی دووهەم لە باکووری ئەفریکا شەڕیان دەکرد، پاش 1942 لە لایەن سەرلەشکر (بێرنارد لاو) مۆنتگۆمێری (Bernard Law) Montgomery (1887-1976) و لە شەڕەکانی ئەلعەلەمەین El Alamein و تۆبرۆک Tobruk لە باکووری ئەفریکا بەشداری کرد. پاشان لە ئیتالیا شەڕی کرد. ◌ ارتش هشتم

**eighth note** *noun*

نۆتی ئۆکتاڤ ◌ نت اکتاو

**eightieth** /ˈeɪtiəθ/ *noun, adjective*

n هەشتایەک *adj* هەشتایەم، هەشتایەمین، هەشتامین ◌ n یک‌هشتادم *adj* هشتادم(ین)

**eightsome reel** *noun*

جۆرێ سەمای کرژی سکاتلەندی هەشت‌کەسە ◌ نوعی رقص

**eighty** /ˈeɪti/ *adjective, noun* (*pl.* eighties)

*adj* هەشتا n ژمارەی هەشتا، ڕەنووسی هەشتا ◌ *adj* هشتاد n عدد هشتاد

**eina** /ˈeɪnɑː/ *noun*

(ئەفریکای باشووری) ژان، ئێش، کێشە ◌ درد، مشکل

**einkorn** /ˈʌɪnkɔːn/ *noun*

گەنمی یەک‌دەنکە ◌ نوعی گندم

**Einstein** /ˈʌɪnstʌɪn/ = genius

**einsteinium** /ʌɪnˈstʌɪmɪəm/ *noun*

(کیمیا) ئاینیشتینیۆم، ئەنیشتینیۆم (بە ز.گ. Es. ن. 99) ◌ انیشتینیم

**eisteddfod** /aɪˈsteðvɒd, US -vɑːd/ *noun, pl.* eisteddfods or eisteddfodau /-ˈvɒdʌɪ/

ئایستێدفاد: فێستیڤاڵێکی پێشبڕکێیانەی ساڵانە بۆ موسیقا، گۆرانی و هەڵبەست لە ویلز ◌ ایستدفود

**eisteddfodic** /-ˈvɒdɪk/ *adjective*

سەربە ئایستێدفود ◌ وابسته به ایستدفود

**Eiswien** /ˈʌɪsvʌɪn/ *noun, pl.* Eisweine /-nə/ or Eisweins

سەهۆڵەمەی، مەیێ کە لە ترێی گەییو دروست دەبێ (کاتێ لێکراوەتەوە کە زوقم لەسەری کەوتووە) ◌ ایسوین

**either** /ˈaɪðə(r), US ˈiːðə(r)/ *adjective, adverb, pronoun*

1 یا، یان، ئان 2 هەریەک (لەو دوانە)، یەکێ لە دوان، یەکێک، یەکێ، هەریەک، هەرکام، هەر، یش، ژی 3 هیچ‌یەک، هیچ‌کام (ئەگەر کارەکە نەرێنی بێ) 4 یان... یان، ها... ها (. . . or either.) ◌ 1 یا 2 یکی از دو تا، هرکدام، هر، هر دو، هم، نیز 3 هیچ‌یک، هیچ‌کدام 4 یا... یا

**either-or** *adjective*, to be an either-or situation

◌ تەنیا دوو ڕێ لە پێش بوون، یان ئەم یان ئەو تنها دو راه وجود داشتن

**ejaculate** /ɪˈdʒakjʊlət/ *noun*

تۆو یان ئاوی فڕێدراو یان دەرهاوێشتراو ◌ تخم انزال‌شده

**ejaculation** /iˌdʒækjuˈleɪʃn/ *noun*

1 قیژە، هاوار 2 ئاوهاتنەوە، کازێری، (دەر)هاوێشتن، دەرپەڕاندن، دانەدەرەوە، دەردان (n ejaculator: (ماسوولکە) دەرهاوێژ؛ ejaculatory /ɪˈdʒakjʊlət(ə)ri/ *adj*: دەرهاوێژ، دەرپەڕێنەر) ◌ 1 فریاد 2 انزال، دفع

**ejaculatory duct** *noun*

لوولەی دەرهاوێژ یان دەرپەڕێنەر (تۆماو) ◌ مجرای انزالی

**ejecta** /ɪˈdʒɛktə/ *noun, pl.*, also ejectamenta

(زۆرتر زەوی‌ناسی و ئەستێرەوانی) دەرهاوێشتە(مەنی)، هاوێژە، هاوێژان، دەرپەڕە، هاوێشتە(مەنی، گڕکان)، شتی فڕێدراو ◌ مواد دفع‌شده یا پرت‌شده

**ejection** /iˈdʒekʃn/ *noun*

دەرهاوێشتن، هاوێشتن، خستنەدەرەوە، دەرخستن، دەرپەڕاندن، دەرکردن، فڕێدان، دانەدەرەوە، دەردان (n ejector: فڕێدەر، دەرپەڕێنەر، دەرهاوێژ(ەر)، ماشە) ◌ اخراج، پرش، پرتاب

**ejective** /ɪˈdʒɛktɪv/ *adjective, noun*

(دەنگ‌ناسی) *adj* دەرپەڕیو n نەبزوێنی دەرپەڕیو (لە هێندێ زماندا ب.ت. Hausa. بەهۆی ئازادبوونی کوت‌وپڕی گوشار و سەنگی لە قوڕگەوە دەردەچێ) ◌ اجکتیو، فورانی

**ejectment** *noun*

1 دەرهاوێشتن، هاوێشتن، خستنەدەرەوە، دەرخستن، دەرپەڕاندن، دەرکردن، فڕێدان 2 (ماف) داوای گێڕانەوە یا سەندنەوە (زەوی‌وزار) ◌ 1 طرد، دفع، اخراج 2 (حقوق) دعوای استرداد

**ejector seat** /iˈdʒektə siːt, US -tər/ *noun,*

also ejection seat
کورسی هاویشتن یان خستنەدەرەوە (فڕۆکە) ◌ صندلی پرتاب
**eke** /i:k/ *adverb* = also (archaic)
**EKG** = ECG
**el-** suffix variant spelling of -le².
**elaborate** /ɪ'læbərət/ *adjective*
وەستایانە، شارەزایانە، ئاڵۆز، پێچەڵاوپێچ، پڕوردەکاری، دووروودرێژ، تیروتەسەل، تیروپڕ، چڕوپڕ (elaborately /ɪ'læbərətli/ *adv*: 1 بە دووروودرێژی، تیروپڕ 2 وەستایانە، شارەزایانە؛ elaborateness /ɪ'læbərətnəs/ *n*: 1 ئاڵۆزی، پێچەڵاوپێچی، شارەزایی 2 وەستاکاری، وردەکاری، وەستایی (لەکاردا) ◌ ماهرانە، پیچیدە، دقیق، مفصل، مبسوط
**elaboration** /ɪˌlæbə'reɪʃn/ *noun*
1 روونکردنەوە، لێکدانەوە، باسکردن (بە دووروودرێژی)، درێژەپێدان، لەسەرڕۆیشتن، فراوانکردن، پەرەپێدان: *the elaboration of an idea* 2 وردەکاری، لقوپۆ 3 پێچەڵاوپێچی 4 مامۆستایی، وەستایی (لە کاردا؛ elaborative *adj*؛ elaborator *n*) ◌ 1 توضیح، تفسیر، شرح، گسترش، بسط 2 جزئیات 3 پیچیدگی 4 استادی
**elaichi** /ɪ'lʌɪtʃi/ = cardamom (Indian)
**Elamite** /ˌi:lə'maɪt/ *noun*
1 ئیلامی، دانیشتووی ڕەسەنی ئیلامی کۆن (باشووری ڕۆژاوای ئێران) 2 زمانی لکاوی Agglutinativeی ئیلامی (لە 25 تا 4 پێشزایین) ◌ عیلامی
**élan** /eɪ'lɒ̃, eɪ'læn, US eɪ'lɑ̃:/ *noun*
(لە فەرەنسەوە) بەپەرۆشی، تامەزرۆیی، تینوگوڕ، کوڵوکۆ، کەفوکوڵ ◌ اشتیاق، شور و شوق
**eland** /'i:lənd/ *noun, pl.* same or elands
ئاسکی ئەفریکایی [*Tragelaphus oryx* و *T. derbianus*] ◌ ایلند
**Elaine** *noun*
ئیلاین: هەریەک لەو چەند ژنەی ئەفسانەی ئارتور، ب.ت. ئەوەی کە لەبەر دڵدارییە یەکلایەنەکەی Lancelot دەمرێ ◌ ایلاین
**elapsed time** *noun*
کاتی بەسەرچوو یان تێپەڕیو، وەختی ڕابووراو ◌ زمان سپری‌شده
**elasmobranch** /ɪ'lazmə(ʊ)braŋk/ *noun, adjective, pl.* elasmobranchii or elasmobranchs
(گیانەوەرناسی) ماسی کرۆژەیی، کرۆژەماسی: جۆرێ ماسی کرکراگەیی یان کرۆژەیی cartilaginous کۆمەڵەی (ژێرپۆلی Elasmobranchii) کە shark ـەکان، ray ـەکان و skate ـەکان دەگرێتەوە ◌ الاسموبرانچ

**elasmosaur** /ɪ'lazmə(ʊ)sɔ:/ *noun*
جۆرێ plesiosaurی کریتاسە، ملدرێژ وەک قاز (بنەڕەت: لە *Elasmosaurus* لاتین، لە *elasmos* یۆنانییەوە "کانزای کوتراو (یان چەکوشکاریکراو)" + *sauros* "مارمێلک") ◌ الاسموسور
**elastane** /ɪ'lasteɪn/ *noun*
ئیلاستەین، ئیلاستان: جۆرێ ماک یان مەتریاڵی پۆلییۆریتین polyurethane، بۆ جلوبەرگی تەنگ بەکاردێنرێ ◌ الاستان
**elastase** /ɪ'lasteɪz/ *noun*
(زیندەکیمیا) ئیلاستەیز، ئیلاستاز: جۆرێ هەوێنەی pancreatic کە ئیلاستین هەڵدەتاوێنێ (یان هەرس دەکا) ◌ الاستاز
**elastic** /ɪ'læstɪk/ *adjective, noun*
*adj* جیر، جیراسا، کەژئاسا، کەژی، کێشی دێ، ئیلاستیک، نەرم، جۆر، لەگۆڕانهاتوو، بگۆڕ *n* جیر، کەژ ◌ *adj* کش‌سان، کشایند، لاستیکی، انعطاف‌پذیر *n* لاستیک
**elasticated** /ɪ'læstɪkeɪtɪd/ *adjective*, also elasticized /ɪ'læstɪsaɪzd/
کەژی، کێشی، کێشهاتوو (جلوبەرگ یان لەتە پەڕۆیی) ◌ کشی
**elastic band** = rubber band
**elastic cartilage** *noun*
کرۆژەی جیر یان جیرئاسا، کرکراگەی کەژئاسا ◌ غضروف کش‌سانی
**elastic collision** *noun*
بەریەککەوتنی جیری، لێکەوتنی جیری ◌ برخورد کش‌سانی
**elastic fibre** *noun*
ریشاڵی جیر یان جیرئاسا، ریشاڵی کەژئاسا ◌ لیف یا فیبر کش‌سانی
**elasticity** /ˌi:læ'stɪsəti, ˌelæ-, US ɪˌlæ-/ *noun*
جیری، جیرئاسایی، کەژئاسایی، نەرمی، بگۆڕی، جۆری، لەگۆڕانهاتوویی ◌ کش‌سانی، کشایندی، قابلیت ارتجاع، انعطاف‌پذیری
**elastic tissue** *noun*
شانەی جیر یان جیرئاسا، شانەی کەژئاسا ◌ بافت کش‌سانی
**elastin** /ɪ'lastɪn/ *noun*
(زیندەکیمیا) glycoprotein یەکی جیری و ریشاڵی کە لە connective tissue دۆزراوەتەوە، پرۆتینێ کە شێوەی collagen دەدا و پێکهێنەری سەرەکی elastic fiber ـەکانە ◌ الاستین
**elastomer** /ɪ'lastəmə/ *noun*
فرەپارژە یان پۆلیمێری دەسکرد یان سروشتی بە تایبەتمەندی کێشییەوە، ب.ت. جیر: *polyvinyl -rs* (elastomeric *adj*) ◌ الاستومر
**Elastoplast** /ɪ'lastəplast, US -plɑ:st/

*noun*
(لە بریتانیا) چەسپی برین ◌ چسب زخم

**elate** /iˈleɪt/ *adjective*
(کۆن) شاد، خۆش، سەرخۆش، بەکەیف، خۆشحال ◌ شادمان، شاد

**elated** /iˈleɪtɪd/ *adjective*
خۆشحال، سەرخۆش، خۆش، شاد، گەش، بەکەیف، کەیفساز، هەژیو، exultant: *They were -ed at the result* ◌ خوشحال، خرسند، مشعوف

**elation** /iˈleɪʃn/ *noun*
سەرخۆشی، شادی، گەشی، هەژان، بەکەیفی، خۆشحالی، گوڕ: *She felt a great sense of -n as she started on the journey* ◌ شعف، وجد، هیجان

**E-layer** *noun*
توێی یان توێژی ئی (ئایۆنۆسفێر کە دەتوانێ شەپۆلە رادیۆییەکانی لەڕەی نێوەڕاست بگێڕێتەوە) ◌ لایەی ای

**Elba** *noun*
ئێلبا: شوێنی دوورخستنەوە، تاراوگە (ناوی دوورگەیێکی ئیتالیا لە مەدیتەرانە، نێوان Corsica و ئیتالیا، شوێنی یەکەمین دوورخرانەوەی ناپۆلیۆن بوناپارت لە 14 مایسی 1814 تا 26 فێبریوێری 1815، 243 کیلۆمیتری چوارگۆشە) ◌ البا، مکان تبعید

**elbow** /ˈelbəʊ, US -boʊ/ *noun*
1 ئانیشکە، ئانیشک، هەرەژنە، کونارشک، زەنگە، میرک، مرک، لاشاخ: *He's fractured his -w* 2 ئانیشکە (لە لوولەکێشیدا) ◌ 1 آرنج 2 زانویی

**elbow grease** *noun*
ڕەنج‌کێشی، گیان‌دەرهاتن، کوڵەمەرگی، کاری سەخت و گران ◌ کار گل

**elbow room** *noun*
شوێن یان جێگای تیاهەڵسووڕان ◌ جای کافی

**eld** /eld/ *noun*
1 (ویژەیی) سەروبەندی پیری، پیری، بەساڵاچوویی 2 سەردەمان یان زەمانی زوو ◌ 1 دوران کهولت، پیری 2 دوران قدیم

**elder¹** /ˈeldə(r)/ *adjective, noun*
1 *adj* باوخۆش‌تر، گەورەتر، بەتەمەن‌تر *n* 2 (هەروەها the older) گەورەتر، پیر، ریش‌سپی، ردین‌سپی، گەورە، پیاوماقووڵ، پێشەوا، سەردار، سالار، سەرکردە 3 (elders) پیاوماقوولان، گەورەپیاوان، گەورەترەکان، باوخۆش‌ترەکان، ریش‌سپییەکان ◌ *adj* بزرگ‌تر *n* 1 بزرگ‌تر، بزرگ، شیخ 2 ریش‌سفید، کدیور، زعیم، ارشد 3 (در جمع) بزرگ‌ترها، بزرگان، ریش‌سفیدان

**elder²** /ˈeldə(r)/ *noun*
(رووەکناسی) ور، گیاور، ورەگیا، گێژەگیا، گیاگێژ [Sambucus nigra] و جۆرە پێوەندیدارەکان] ◌ آقطی

**elderberry** /ˈeldəberi, US ˈeldərb-/ *noun, pl.* elderberries
بەر یان میوەی ورەگیا ◌ میوەی آقطی

**elderflower** *noun*
گوڵەورە (بۆ دروس‌کردنی مەی و کوردیال) ◌ گل آقطی

**elderly** /ˈeldəli, US -ərli/ *adjective, noun*
*adj* بەساڵاچوو، بەتەمەن، پیر، کۆنە، لەکارکەوتوو، پەککەوتوو *n* (the elderly) بەساڵاچووان، پیران، بەتەمەنان ◌ *adj* مسن، سالخورده، قدیمی *n* (the elderly) سالخوردگان

**eldership** *noun*
گەورەتریتی، گەورەیی ◌ ارشدیت

**elder statesman** *noun*
پیری سیاسی، راوێژکاری سیاسی ◌ رجل سیاسی معمر

**eldest** /ˈeldɪst/ *adjective*
گەورەترین، بەساڵاچووترین، پیرترین، بەتەمەن‌ترین، گەورە، نۆبەرە، نخری ◌ ارشد، بزرگ‌ترین، نخست‌زاده

**eldorado** /ˌel dəˈrɑːdəʊ/ *noun,* also El Dorado, *pl.* El Dorados
زێڕستان، زێڕان، زێڕەلان، ولاتی زێڕ (ولات یان شاری خەیاڵی کانزای بەنرخ تیاهەڵکەوتوو، جاران باوەڕ وابوو کە لە ئەمریکای باشووری بێ) ◌ الدرادور، سرزمین زر

**eldritch** /ˈel(d)rɪtʃ/ *noun*
سەیر، سەمەرە، نائاسایی، عاجباتی ◌ غیرعادی، عجیب

**Eleatic** /ˌeliˈætɪk/ *adjective, noun*
*adj* 1 سەربە شاری کۆنی یۆنانی Elea لە باشووری رۆژاوای ئیتالیا 2 سەربە ریبازێکی فەلسەفی یۆنانی کە لە لایەن Parmenides ـەوە دامەزرا و Zeno و Xenophanes پەرەی پێدا و یەکێکی تر لە فیلسووفەکانی ئەو ریبازەیە، باوەڕی بە یەکێتی بوون و ناڕاستینەبوونی جووڵە و گۆڕان هەیە *n* فیلسووفێکی ئەو ریبازە ◌ الیاتیک

**Eleaticism** *noun*
ئێلیاتیسیزم ◌ الیاتیسم

**elecampane** /ˌelɪkæmˈpeɪn/ *noun,* also inula or scab-wort
(رووەکناسی) سمڵ؟، سملی؟: زەنجەفیلێ لە تیرەی daisy [*Inula helenium*] ◌ راسن، زنجفیل شامی

**elect** /ɪˈlekt/ *adjective*
*adj* هەڵبژاردە *n* (the elect) هەڵبژاردەکان، هەڵبژێراوان، تایبەتان، تایبەتمەندان ◌ *adj* منتخب، برگزیده *n* برگزیدگان، نخبگان

◌ *young folk were emigrating en masse* همگی، دسته‌جمعی

**enmeshed** *adjective*
گیرۆدەی، پێوەبووی، تووش‌بووی، گرفتاری، تێوەگلاوی، دیلی، تێوەردراوی ◌ گرفتار

**enmity** /'enməti/ *noun, pl.* enmities
دوژمنی، دوژمنایەتی، گاقبەری، ناحەزیتی، ناخۆشی ◌ خصومت

**ennead** /'ɛnɪad/ *noun*
(دەگمەن) دەستەیێکی نۆدەنکی، نۆدانەیی ◌ گروه نه‌تایی

**ennoblement** *noun*
بردنەسەرەوە، هەلکێشان، پایەبەرزکردنەوە، گەورەکردن، گەورەیی‌پێدان، گەورەیی، شەرەف ◌ ترفیع، منزلت‌بخشی، شرافت

**ennui** /ɒn'wi: , US ɑ:n-/ *noun*
ناقایلیتی، بێ‌تاقەتی، بێزاری، داهێزراوی، دەس‌تێوەنەچوویی، ماندوویی، شەکەتی، هیچێتی، هیچەکەیی، بێهوودەیی، boredom ◌ بی‌حوصلگی، پوچی‌زدگی، ملالت

**enol** *noun*
ئینۆل، ناوێتەیێکی ئەندامی بە شێوگی formula C=C(OH)، کۆمەلی hydroxyl تیایە ( enolic *adj*، ئینۆلی، سەربە ئینۆل) ◌ انول

**enolization** *noun*
ئینۆلاندن، ئینۆلان، ئینۆلین، ئینۆلیزەیشن ◌ انولیزاسیون

**enology** = US spelling of oenology

**enormity** /ɪ'nɔ:məti, US ɪ'nɔ:rm-/ *noun, pl.* enormities
1 گەورەیی، بەربلاوی، خراپی زۆر، تاوان (بەرشت)، ناحەزی، قەبەیی، پیسی، ناشیرینی، ستەم، کاری ناحەز: *the enormity of the task* 2 (enormities) تاوانەکان، تاوان‌کاری‌یەکان ◌ 1 عظمت، جنایت، شناعت، عمل زشت 2 (در جمع) فجایع، جنایات

**enormous** /ɪ'nɔ:məs, US ɪ'nɔ:rməs/ *adjective*
(یەکجار) گەورە، زەبەلاح، قەبە، قەپە، گەپ، کەتە، یەکجار زۆر، زۆروزەبەن، لەرادەبەدەر ◌ عظیم، بزرگ، کلان، هنگفت، فوق‌العاده

**enormously** /ɪ'nɔ:məsli, US ɪ'nɔ:rm-/ *adverb*
یەکجار زۆر، لەئەندازبەدەر: *enormously rich/powerful* ◌ فوق‌العاده

**enormousness** *noun*
گەورەیی، زەبەلاحی، زۆروزەبەنی ◌ عظمت، هنگفتی

**enosis** /ɪ'nəʊsɪs, US 'ɛnəsɪs/ *noun*
یەکێتی رامیاری یان سیاسی قوبرس و یۆنان ◌ انوسیس

**enough** /ɪ'nʌf/ *noun, adjective, adverb*
1 بە رادەی پێویست 2 بەش‌کردوو، تەواو، بەس، ئەندازە، سەروزیاد ◌ 1 بە قدر کافی 2 کافی، مقدار کافی

**en passant** /ˌɒ̃ 'pæsɒ̃, US ˌɑ̃: pæ'sɑ̃:/ *adverb*
(لە فەرەنسەوە) بە کورتی، سەرسەرەکی، بە راگوزاری ◌ به اجمال

**enquirer** /ɪn'kwaɪərə(r)/ *noun*
پرسیارکەر، لێ‌پرس، پرسا، پرسینەر ◌ سؤال‌کننده، مراجع

**enquiring** /ɪn'kwaɪərɪŋ/ *adjective*
بەپرسیار، پرسیارکار، پرسا، پرسیارلێکەر (بۆ زانیاری)، پرسیارکارانە ( enquiringly /ɪn'kwaɪərɪŋli/ *adv*) ◌ کنجکاو، پرسش‌گر، پرسش‌گرانه

**enquiry** /ɪn'kwaɪəri, US 'ɪnkwəri/ *noun, pl.* enquiries
پرس، پرسین، پرسیار، پرسیارکردن، گەڕان، پشکنین، لێکۆڵینەوە، لێ‌پرسینەوە: *a murder enquiry* ◌ پرسش، پرس و جو، تحقیق، بازجویی

**enquiry agent** = privare detective

**enraged** *adjective*
تووڕە، رق‌هەستاو، قەلس، ئاژری، گرژ ◌ خشمگین، عصبانی

**enraptured** /ɪn'ræptʃəd, US -ərd/ *adjective*
خۆشحاڵ، بەکەیف، بەجۆش‌هاتوو، بەدەماغ، کەیف‌ساز، کەیف‌خۆش، شاد، سەرخۆش ◌ مشعوف، به وجد آمده

**enrichment** *noun*
بەپیتی، مایەداری، پیتاندن، زاخاندن، دەولەمەندکردن، مایەدارکردن، مایاندن، زاخاودان، زاخ‌کردن (enriched *adj*: دەولەمەند، پیتێنراو، زاخێنراو، زاخ‌کراو، زاخاودراو، مایەدار، مایەوەر) ◌ غنا، غنی‌سازی

**enrolee** /ɪnˌrəʊ'li: , US ɪnˌroʊ-/ *noun*
ئەندام ◌ عضو

**Enrolled Nurse** *noun*
نەخۆشیاری رێگەدراو ◌ پرستار مجاز

**enrolment** /ɪn'rəʊlmənt, US -'roʊl-/ *noun*, US enrollment
ناونووسی، کردنەئەندام، ئەندامانەدن، نێونووس‌کراوان، ژمارەی ئەو کەسانەی کەوا ناویان نووسراوە، ژمارەی ناونووسراوان (ب.ت. لە کۆلێژ یان خوێندگاییک‌دا) ◌ ثبت‌نام، تعداد ثبت‌نام‌کنندگان

**en route** /ˌɒ̃ 'ru:t, ˌɒn, US ˌɑ̃:, ˌɑ:n/ *adverb*
(لە فەرەنسەوە) سەرەڕێ، لەسەرڕێ، لە رێگا: *he arrived early despite en route delays* ◊

در راه ◯ *reads en route*

**Ens** *abbreviation* Ensign

**ensample** *noun*

نموونه، میناک، example، instance ◯ الگو

**ensanguined** /ɪn'sæŋgwənd/ *adjective*

خویناوی، شەلالی خوێن ◯ خون‌آلود

**ensconced** *adjective*

جێخۆش‌کردوو، گیرساو، جێگیربوو، جێگرتوو، دامەزراو، سەقامگرتوو، بنەگیر ◯ قرارگرفته، مستقر

**ensemble** /ɒn'sɒmbl, US ɑːn'sɑːmbl/ *noun, adjective*

1 (لە فەرەنسەوە) تیپی مۆسیقا 2 تیپی هەڵپەڕکێ 3 دەستەی ئەکتەران 4 تیپی مۆسیقاژەنان 5 کۆمەڵە، دەستە؛ دەستە جل (پێکەوە دەپۆشرێن) 6 پێکەوە، هەموو، گشت، تێکڕا 7 یەکێتی ◯ 1 گروه موسیقا 2 گروه رقص 3 گروه هنرپیشگان 4 گروه نوازندگان 5 مجموعه 6 باهم 7 وحدت، یگانگی

**enshrinement** *noun*

پاراستن، ئاگالێبوون، بەرێزکردن، رێزپێدان ◯ حفظ، مقرب‌سازی

**ensiform** /'ensɪfɔːm/ *adjective*

شمشێری، خەنجێری، خەنجەری: *ensiform leaves* ◯ شمشیری، خنجری

**ensiform cartilage** *noun*, also xiphoid process

کرۆژەی شمشێری، کرکراگەی خەنجێری ◯ غضروف شمشیری

**ensign** /'ensən/ *noun*

1 ئاڵا، بەیداخ (کەشتی) 2 ئەفسەرێکی هەرە پایەنزم لە هێزی دەریاییدا 3 (مێژوویی) پایەنزمترین ئەفسەری پلەداری سپای پیادەی ئەرتەشی بریتانیا 4 (مێژوویی) ئاڵاهەڵگر ◯ 1 پرچم (کشتی) 2 ناوبان دوم 3 و 4 انسن

**ensilage** /'ensɪlɪdʒ, US en'sʌɪlɪdʒ/ = silage

**enslaved** *adjective*

کۆیلە، بەندە، گیرۆدە ◯ برده، اسیر

**enslavement** *noun*

1 کۆیلەیی، کۆیلاندن، بەکۆیلەکردن، کردنەکۆیلە 2 دیلی، یەخسیری، بەندەیی 3 گیرۆدەیی، پێوەبوون ◯ 1 بردگی، برده‌سازی 2 بندگی 3 اسارت

**enslaver** *noun*

کۆیلێنەر، بەکۆیلەکەر ◯ برده‌ساز

**ensnarement** *noun*

خستنەداوەوە، بەتەڵەوەکردن، بە داوەوە کردن، پێوەکردن ◯ به دام‌اندازی

**ensorcellment** *noun*

سەرنجڕاکێشی، دڵڕفێنی، دڵفڕێنی، ڕاکێشان، سەوداسەری، شەیدایی، دڵبەستەیی ◯ جذبه، گیرایی، شیفتگی

**ensuing** *adjective, adverb*

دوایی، دواتر، پاش‌تر ◯ بعدی

**en suite** /ˌɒ̃ 'swiːt, US ˌɑː/ *adverb*

(لە فەرەنسەوە) لەگەڵ، connected: *bathroom* ◯ همراه *en suite*

**-ent** = -ant

**ENT** /ˌiː en 'tiː/ *abbreviation* ear, nose and throat

گوێ، لووت و گەروو ◯ گوش و حلق و بینی

**entablature** /en'tablətʃə, US ɪn-/ *noun*

(ئیتالیایی، بیناسازی) ئانتابلاتور (بەشی سەرەوەی سەرستوون کە architrave، frieze و cornice دەگرێتەوە) ◯ انتابلاتور

**entablement** /en'teɪb(ə)lm(ə)nt, US ɪn-/ *noun*

سەکۆ یان هەرزاڵەی (ژێر) پەیکەر ◯ سکوی مجسمه

**entail** /ɪn'teɪl/ *noun*

تەرخان، دارایی تەرخانکراو، تەرخانە ◯ وقف، مال موقوف

**entailment** *noun*

1 لەخۆگرتن، برینەبەرخۆ، هەڵگرتن، بردن، داگرتن، تیابوون 2 تەرخان، مڵک و دارایی تەرخانکراو، تەرخانە ◯ 1 تضمن، استلزام 2 وقف، ملک موقوفه

**entangled** *adjective*

1 گیرکردوو، پێوەبوو، ئاڵاو، تێوەگلاو، گیرکەوتوو، دوچاربوو، تووشبوو، وەردراو 2 ئاڵۆسکاو، تێکئاڵاو، شێواو، گرێدار، تێکچرژاو، لێکئاڵاو ◯ 1 گرفتار 2 درهم‌پیچیده

**entanglement** /ɪn'tæŋglmənt/ *noun*

1 گیرکردن، پێوەبوون، تووشبوون، گیر، قۆرت، گرێ، تێوەگلان، دوچاربوون، ئاڵاوی، گێچەڵ، مایەی تووشبوون یان گیر، تێوەگلێنە: *The* ◊ *emotional/political entanglements auditors try to avoid entanglement with arguments over local policy* 2 (سەربازی) تۆری تێلبەند، تێلبەندان، لەمپەری ئاسندڕک 3 (entanglements) بەربەستی تێلبەند، دوژمن‌گیرەوە ◯ 1 گرفتاری، درگیری، آشفتگی، مایەی گرفتاری 2 مانع سیم خاردار 3 (در جمع) مانع سیم‌خاردار

**entasis** /'entəsɪs/ *noun, pl.* entases

(بیناسازی، سووکەدەرپەڕیوی، دەرپۆقیوی، قۆقزی ◯ برآمدگی

**entelechy** /en'teləki, US ɪn-/ *noun, pl.* entelechies

(فەلسەفە) ڕاستی، پێگەیشتوویی ◯ واقعیت، کمال

**entente** /ɒn'tɒnt, US ɑːn'tɑːnt/ *noun, pl.* also entente cordiale /ˌkɔːdɪ'ɑːl/, *Fr*

پێوەندی دۆستانە، ڕێککەوتن، لێکگەیشتن،

ریک‌کەوتنی دەوڵەتەکان، هاوپەیمانی: *the Franco-Russian -tente* ◌ روابط حسنه، تفاهم

**the Entente Cordiale** /ˌɒntɒnt ˌkɔːdiˈɑːl, US ˌɑːntɑːnt ˌkɔːrd-/ *noun*
لێک‌گەیشتنی نێوان فەرەنسە و بریتانیا لە 1904دا کە بنەڕەتی هاوکاری Anglo-Frenchیان لە شەڕی جیهانی یەکەمدا دامەزراند) ◌ تفاهم میان فرانسه و انگلستان

**enter(o)-** *prefix*
پێشگر: ریخۆڵە، رووفی: *enterovirus* (بنەڕەت: لە *enteron* یۆنانی‌یەوە "intestine") ◌ پیشوند: روده

**enteric** /enˈterɪk/ *adjective*, also enteral /ˈɛntər(ə)l/
ریخۆڵەیی، سەربە ریخۆڵە ◌ وابسته به روده

**enteric fever** *noun*
کەوتوویی، گرانەتا، ریخۆڵەتا، typhoid و paratyphoid ◌ حصبه

**enteritis** /ˌentəˈraɪtəs/ *noun*
ریخۆڵەسوێ، ریخۆڵەئاوسان، هەوکردنی ریخۆڵە ◌ التهاب روده

**enterobacteria** *noun, sing.* enterobacterium
بەکتریا(کان)ی ریخۆڵە، ئینتێرۆباکتریا: بەکتریا شێوەمیلەکانی گرامی نەرێنی gram-negative خێزانی Enterobacteriaceae (وەک سالمۆنێلا salmonella، شیگەلا shigella یان E. coli) کە بە شێوەیێکی ئاسایی یان نەخۆش‌خەرانە pathogenically لە نێو ریخۆڵەکاندا هەیە ◌ انتروباکتریا

**enterobiasis** *noun, pl.* enterobiases
ئینتێرۆبیاز، ئینتێرۆبیاسیس، تێدان infestation یان نەخۆش‌کەوتن بەهۆی کرمۆکەکانەوە pinworm [تۆخم *Enterobius* ب.ت. *E. vermicularis*] کە ب.ت. لە منالان دایە ◌ انتروبیاز

**enterococcus** /ˌɛntərəʊˈkɒk(ə)s/ *noun, pl.* enterococci /-ˈkɒk(s)ʌɪ, -k(s)iː/
سترێپتۆکۆک streptococcusی [*Enterococcus faecalis*] کە بە شێوەیێکی سروشتی لە نێو ریخۆڵە دایە و دەتوانێ لە‌ش لە جێگایێکی تر تووشی نەخۆشی کا (*adj* enterococcal: سەربە ئینتێرۆکۆکۆس) ◌ انتروکوکوس

**enterocoele** *noun*, also enterocoel
بۆشایی ریخۆڵەیی: بۆشایی یان کەلێنێ کە بەهۆی کشانی لە رادەبەدەری دەزگای هەرس پێکهاتبێ (*adj* enterocoelic: سەربە یان پێوەندی بە بۆشایی ریخۆڵەیی‌یەوە هەیە) ◌ حفره ی رودهای

**enterocolits** *noun*
ئاوسانی ریخۆڵە و کۆلۆن ◌ التهاب روده و قولون

**enterocrinin** *noun*
هۆرمۆنێ کە لە ریخۆڵەی گیانەوەراندا بەرهەم دێترێ و دەبێتە هۆی تاودانی چالاکی لوو یان رژێنەی ریخۆڵەباریکە ◌ انتروکرینین

**enterogastrone** *noun*
هۆرمۆنی کێمەپەردەی ریخۆڵەیی intestinal mucosa کە جووڵان(ـەوە) و دەردانی مێعدە خاو دەکاتەوە ◌ انتروگاسترون

**enterokinase** *noun*
هەوێنەیێکی کێمەپەردەی ریخۆڵەیی کە trypsinogen بە گۆڕینی بۆ تریپسین چالاک دەکا ◌ انتروکیناز

**enterology** /ˌentəˈrɒlədʒɪ/ *noun*
ریخۆڵەناسی ◌ رودەشناسی

**enteron** *noun, pl.* entera
لوولەی دەزگای هەرس، جۆگە (کانال) یان کۆئەندامی هەرسی، ب.ت. لەبارەی هی ئالەمەوە بەکاردێترێ ◌ مجرا یا دستگاه گوارشی

**enteropathogenic** *adjective*
ریخۆڵەنەخۆش‌خەر: نەخۆشی دەنێتەوە بۆ دەزگا یان کۆئەندامی ریخۆڵە <enteropathogenic bacteria> ◌ انتروپاتوژنیک

**enteropathy** /ˌentəˈrɒpəθi/ *noun, pl.* enteropathies
نەخۆشی ریخۆڵە(یی) ◌ بیماری رودەای

**enterostomy** /ˌɛntəˈrɒstəmi/ *noun, pl.* enterostomies
ئینترۆستۆمی: نەشتەرگەری‌یێ کە لەودا کونێ لە نێو ریخۆڵە بە ریگای دیوارەی زگەوە تێ‌دەکرێ (*adj* enterostomal) ◌ انترواستومی

**enterotoxemia** *noun*
ژاراویبوونی خوێنی لە لایەن ریخۆڵەژاراو(ەوە) کە لەودا گشت لەش دەتەنێتەوە systemic ◌ انتروتوکسمیا

**enterotoxigenic** *adjective*
enterotoxin بەرهەم دێنێ، ریخۆڵەژاراو(ک)ساز ◌ انتروتوکسیژنیک

**enterotoxin** /ˌɛntərəʊˈtɒksɪn/ *noun*
(پزشکی) ریخۆڵەژاراو(ک): ژاراوک یان تۆکسینێ کە بەهۆی وزەدزیندەوەرەکانەوە (وەک هێندێ staphylococci) بەرهەم دێترێ و دەبنە هۆی کۆنیشانەی gastrointestinal (وەک رشانەوەی سەخت یان ژاراوی‌بوون بە خۆراک، زگەشۆرە یان cholera) ◌ انتروتوکسین

**enterovirus** /ˈɛntərəʊˌvʌɪrəs/ *noun, pl.* enteroviruses
(پزشکی) ئینتێرۆڤایرۆس، ئینتێرۆڤیرۆس: کۆمەڵی ڤایرۆسەکانی RNA (ب.ت. ئەوانەی کەوا دەبنە هۆی نەخۆشی‌یەکانی polio و هێپاتیتی A) و زۆرتر لە دەزگای gastrointestinal هەن (*adj* enteroviral) ◌ انتروویروس

**enterprise** /ˈentəpraɪz, US -tərp-/ *noun*

2 ڕیزلێنان، سەنگاندن، بردنەسەرەوە، بەرزکردنەوە ۞ 1 تاج‌گذاری، اجلاس 2 ارج‌بخشی

**enthusiasm** /ɪn'θju:ziæzəm, US -'θu:-/ *noun*
1 بەپەرۆشی، تامەزرۆیی، تین‌وگوڕ، تاوسەندن، بەشەوقی، هۆگری، دلبەستەیی، وروژان، هەژان، سەرقالی، رابواردن 2 (کۆن، سووکانە) لەدڵنران، ئیلهام، سەرۆ ۞ 1 اشتیاق، علاقە، دلبستگی، هیجان، تفریح 2 الهام

**enthusiast** /ɪn'θju:ziæst, US -'θu:-/ *noun*
مرۆی بەپەرۆش، تامەزرۆ، دلبەستە، بەتاو، بەشەوق، لەگوڕ ( enthusiastic /ɪn,θju:zi'æstɪk, US -,θu:-/ *adj*: بەتاو، تامەزرۆ، پڕتین‌وگوڕ، پڕتاو، بەتاسە، بەپەرۆش، بەدڵ، بەگوڕ، جۆش‌سەندوو، بەتین، دلبەستە، بەشەوق؛ enthususiatically /-kli/ *adv*: بە تین‌وگوڕەوە، گەرم‌وگوڕانە، بە پەرۆشەوە) ۞ آدم مشتاق، علاقمند

**enticement** *noun*
1 تەفرەدان، فریودان، لەخشتەبردن، هەلخەلەتاندن، هەلفریواندن، تاودان، راکێشان 2 شتی هەلفریوێنەر، مایەی هەلفریواندن یان تەفرەدان ۞ 1 اغفال، فریب، کشش 2 چیز اغفال‌کننده، وسیلەی اغوا

**enticing** /ɪn'taɪsɪŋ/ *adjective*
تەفرەدەر، لەخشتەبەر، هەلفریوێنەر، سەرنج‌راکێش، هەلخەلەتێنەر: *The offer was too enticing to refuse* :enticingly *adv*) تەفرەدەرانە) ۞ اغواگر، جذاب، وسوسەانگیز

**entire** /ɪn'taɪə(r)/ *adjective*
1 تەواو، گشت، سەرجەم، هەموو، تێکڕا(ی)، سەرپاکی، سەرانسەر: *was alone the entire day* ◊ *The entire village was destroyed* ◊ 2 *I wasted an entire day on it* دەس‌لێنەدراو، کەمی نییە، یەک‌پارچە، یەک‌تەختە، یەک‌تێکە، ساغ، بێگەرد، 3 unmixed ,homogeneous (ئەسپی نێر) یەختەنەکراو، نەخەساو (:entireness *n* تەواوێتی، گشت) ۞ 1 کامل، تمام، محض، همە 2 دست‌نخوردە، سالم 3 اختەنشدە

**entirely** /ɪn'taɪəli, US ɪn'taɪərli/ *adverb*
بە تەواوەتی؛ solely: *I entirely agree with you* ۞ کاملا

**entirety** /ɪn'taɪərəti/ *noun*
تەواوەتی، گشت، سەرجەم، تێکڕای ( in its/their entirety: هەمووی، بە تەواوی، بە گشتی، تێکڕای، سەرپاکی) ۞ کل، تمامیت، جمع کل

**entitled** *adjective*
بە نێوی، لەژێرناوی، حەق‌بەدەست، بەرحەق، بەرهەق، حەقدار، ماف‌بەدەست، رێگەدراو ۞ تحت عنوان، محق

1 کار، کردەوە، کردە، دەس‌تێدان 2 مەترسی‌کاری، وێران، بێ‌باکی، دڵ‌وجەرگ، دڵ، نەترسی، غیرەت، کردەوەی نەترسانە، کاری گرنگ یان پڕمەترسی 3 پڕۆژەکاری، چالاکی کارداری 4 (کاری) دووبەختەکی، مەترسی 5 کار و کاسپی، سەودا 6 کۆمپانی، نێوکۆیی، دامەزرە، دەزگا ۞ 1 کار، عمل، مبادرت 2 جسارت، شجاعت، عمل تهورآمیز، اقدام مهم 3 فعالیت بازرگانی 4 خطر 5 کسب و کار 6 شرکت، مؤسسە

**enterprising** /'entəpraɪzɪŋ, US -tərp-/ *adjective*
نەترس، مەترسی‌کار، مەترسی‌خواز، بەغیرەت، بەدڵ، بەجەرگ، بێ‌باک، سڵ‌نەکردوو، نەترسانە: *an enterprising young woman* (enterprisingly *adv*) ۞ جسور، متهورانە

**entertainer** /,entə'teɪnə(r), US -tər't-/ *noun*
1 هونەرمەندی نوکتەبێژ، بەزم‌گێر، گالتەچی 2 (ب.ت. پیشەیی بێ): *a street entertainer* ئاکتەر ۞ 1 هنرمند کمدی 2 بازیگر

**entertaining** /,entə'teɪnɪŋ, US -tər't-/ *adjective, noun*
*adj* خۆش، سەرقال‌کەر، خافلێنەر، دڵرفێن، وەپێکەنین‌هێن، بۆرابواردن، diverting: - *an entertaining speaker* ◊ *rtaining book an* *n* میوانداری (entertainingly *adv*) ۞ *adj* سرگرم‌کنندە، مشغول‌کنندە، لذت‌بخش *n* پذیرایی

**entertainment** /,entə'teɪnmənt, US -tər't-/ *noun*
1 میوانی، میوانداری 2 رابواردن، خۆشی، بەزم، سەرقالی، ئاسوودەیی، سەرگەرمی، خەریکی، پیشاندان 3 مایەی سەرقالی یان رابواردن ۞ 1 مهمانی، پذیرائی 2 تفریح، تفنن، نمایش 3 وسیلەی تفریح

**enthalpy** /'ɛnθ(ə)lpi, US ɛn'θalpi/ *noun*
(فیزیک) بڕی تێرمۆدینامیک بەرامبەر بە سەرجەم گەرمی نێوەوەی سیستەم (بنەڕەت: لە *enthalpein* یونانی (کار)، لە -en "نێوەوە" + *thalpein* " گەرماندن، گەرم‌کردن "to heat") ۞ انتالپی

**enthralled** *adjective*
گیرۆدە، گرفتار، شێت، تەلەسم‌کراو، شەیدا، تاوسەندوو ۞ مجذوب، شیفتە

**enthralling** *adjective*
سەرنج‌راکێش، بالکێش، دڵرفێن، خۆش، شێت‌کەر، تەلەسماوی ۞ جذاب، مسحورکنندە

**enthralment**, US enthrallment = enslavement

**enthronement** *noun*
1 (ڕێ‌ورەسم) لەسەرتەخت‌دانان، تاج‌لەسەرنان (شا، شاژن و سەرقەشە)، دانیشاندن (لەسەرتخت)

**entitlement** /ɪn'taɪtlmənt/ *noun*
1 حـەق‌پێـدان، مـاف‌پێـدان، حـەق‌بەدەسـت، بەرحەق، حەق‌پێ‌شیاو، پێ‌ڕەوا، شیاو، لێوەشاو 2 ماف، حەق 3 نێولەسەرنان، سەرناوپێدان، نێودانان ۞ 1 استحقاق، مورد استحقاق 2 حق 3 ملقب‌سازی

**entity** /'entəti/ *noun, pl.* entities
1 شت، تشت، بوون، هەیی، بوونەوەر، بوونێتی، بونایەتی 2 گەوهەر، کرۆک، جەوهەر، زات ۞ 1 چیز، هستی، وجود، موجودیت 2 ذات، ماهیت

**entobment** *noun*
بەخاک‌سپاردن، ناشتن، قەشارتن، بنگڵ‌کردن ۞ تدفین

**entom** or **entomol** *abbreviation*
entomological; entomology

**entom(o)-** /'ɛntəməʊ/ *prefix*
پێشگر: مێروو: *entomophagous* (بنەڕەت: لە *entomon* یۆنانی‌یەوە) ۞ حشره

**entomofauna** *noun*
مێرووان، مێرووەکانی ژینگە یان ناوچەیێ ۞ حشرات، انتوموفونا

**entomology** /ˌentə'mɒlədʒi, US -'mɑːl-/ *noun*
مێروناسـی، جانـەوەرناسـی (entomological /ˌentəmə'lɒdʒɪkl, US -'lɑːdʒ-/ *adj*; entomologically *adv*; entomologist /ˌentə'mɒlədʒɪst, US -'mɑːl-/ *n*) ۞ حشره‌شناسی

**entomophagous** *adjective*
مێرووخـۆر، insectivorous (entomophagy *n*) ۞ حشره‌خوار

**entomophilous** /ˌɛntə'mɒfɪləs/ *adjective*
(ڕووەکناسـی) مێرووخواز، پیتێنراو یا چاکراو بـە مێـروو (entomophily *n*: مێرووخـوازی، پیتان یان چاکران بە مێروو) ۞ انتوفیلوس

**Entoprocta** /ˌɛntə(ʊ)'prɒktə/ *noun, pl.*
(گیانـەوەرناسـی) نێوکۆمـان: لکێکـی چکۆلـەی گیانـەوەرانی بـێ‌بڕبـڕەی جـێگیری sedentary ئـاوی (بنـەڕەت: لـە *entos* یۆنـانی "(لـە)نێـو" + *prōktos* "کۆم anus"، کۆمیـان نزیـک بـە دەمیـان هەڵکەوتووە؛ *entoproct n*) ۞ درون‌مرزیان

**entourage** /'ɒntʊrɑːʒ, US ˌɒntʊ(ə)'rɑːʒ/ *noun*
1 لەگـەڵبـوان، دەس‌وپێونـد، دەسـتەودایرە، داروودەسـتە، هـاوڕێیـان: *an entourage of adoring fans* 2 دەوروبـەر، دەوروپـشت 3 دەسـتە، کۆمـەڵ، تـاقم ۞ 1 ملتـزمین، ملازمـان، رکاب 2 محیط 3 جماعت

**entozoic** *adjective*, also entozoal
(گیانـەوەرێکـی مـشەخـۆر) لـەنێـو لـەشـی هاوخوانەکەیا host دەژی ۞ داخلی

**entozoon** *noun, pl.* entozoa
هـەر گیانـەوەرێکـی مـشەخـۆر، وەک کرمـی نێوڕیخۆڵە کە لەنێو لـەشـی هاوخوانـەکـەیا host دەژی ۞ انگل داخلی

**entr'acte** /'ɒntrækt, 'ɒ̃t-, US 'ɑːntrækt, ɑːn'trækt/ *noun, French*
هەڵوەسـتە، وچـان، پـشوو، هەناسـە (نێـوان دوو شانۆ) ۞ آنتراکت، وقفه

**entrails** /'entreɪlz/ *noun, pl.*
دڵوریخۆڵـــە، هـــەناو، پـــزور، نـــاوزگ، گورگان‌خواردوو ۞ امعا و احشا

**entrain** /ɒ̃'trɑ̃/ = enthusiasm, animation

**entrance** /'entrəns/ *noun*
1 نـاودەم (ب.ت. تەنگـەلان یـان تونێـل)، درگـا، دەرکـە، ژوورەڕێ، ژوورگـە، گـوزەر، چوونگـە، ڕێـژوور، ڕێـڕەو، جێگـای چوونـەژوورەوە 2 ژوورەوەچـوون، چوونـەنێو(ەوە)، خۆپیـاکردن، توانای چوونەژوورەوە، مافی چوونەوەژوورەوە، دەستووری چوونەژوورەوە ۞ 1 مدخل، در، راهرو، ورودی 2 دخول، امکان ورود، ورود، حق ورود

**entranced** *adjective*
گیرۆدە، گرفتـار، تەلەسم‌کراو، شێت‌وشـەیدا ۞ مجذوب

**entrance fee** *noun*
درگانە، ژوورانـە، حـەقی چوونـەژوورەوە، مـافی چوونـەنێو یـان ئەنـدامێتی (بەئەنـدامبـوون) ۞ ورودیه، حق عضویت

**entrance hall** *noun*
هۆڵی چوونەژووری (لە خانووبـەرەی گـشتی‌دا) ۞ سالن ورودی

**entrancing** *adjective*
تەلـەسماوی، تـەفرەدەر، دڵـڕفێن، شـێت و شـەیداکەر، گیرۆدەکـەر (entrancing *adv*) ۞ مسحورکننده

**entrant** /'entrənt/ *adjective*
1 خوازیار، بەشداری‌کەر، ژوورەوەهاتوو، نەیار، هەڤڕک، بەرچەپ 2 تازەهـاتوو ۞ 1 داوطلب، شرکت‌کننده، رقیب 2 واردشونده

**entrapment** /ɪn'træpmənt/ *noun*
1 پێـوەکردن، تـووش‌کـردن، تێوەگلانـدن، دوچـارکردن، خـستنەگیر 2 لەخـشتەبردن، هەڵـفریواندن، فریـودان، تـەفرەدان، خاپانـدن، بەداوۆکردن، خستنەتەڵەوە ۞ 1 گرفتارسـازی 2 اغفال، تله‌گذاری

**entreaty** /ɪn'triːti/ *noun, pl.* entreaties
تکـا(کـاری)، پاڕانـەوە، دەسـەوداوێن، دەم‌پان‌کردنەوە، لاڵانەوە، ڕوولێنان، داخـوازی: *Despite her entreaties, he left* (entreatingly *adv*: بـە پاڕانـەوە، بـە تکـا و لاڵانەوەوە) ۞ تمنا، التماس، استدعا، درخواست

**entrée** /'ɒntreɪ, US 'ɑːn-/ *noun*
1 (لە فەڕەنـسەوە) رایـە، مـاف یـان توانـایی (یـان

ئـازادی) چوونـەژوورەوە (تێـو کۆمـەڵ یـان دەزگایێ) 2 چێشت یا خۆراکی سەرەکی (دوای ماسی) ⬡ 1 امکان یا حق ورود 2 عذای اصلی

**entremets** /ˌɒntrəˈmeɪ/ *noun*

چێشتێکی خۆش سەرەڕای بەرنامەی ئاسایی ⬡ انترمتس

**entrenched** *adjective*

1 جـێگیر، چەسـپیو، جێگرتـوو، داکـوتراو، ڕەگداکوتاو 2 سەنگەردانراو، سەنگەرگرتوو ⬡ 1 مستحکم 2 سنگربندی‌شده

**entrenchment** /ɪnˈtrentʃmənt/ *noun*

1 سـەنگەردانان، چەپـەردانان، سـەنگەرگرتن، سـەنگـەرگـیری 2 سـەقامگـیری، چەسـپین، دامـەزران، داکـوتران، دامەزرانـدن، چەسـپاندن، داکوتانـدن، جێگیرکردن، سـەقامگیرکردن ⬡ 1 سنگربندی 2 استقرار، مستحکم‌سازی

**entre nous** /ˌɒ̃trə ˈnuː/ *adverbm* from French

نهێنی، لەنێوخۆماندا بێ، نەچێتەدەرێ، بمێنێتەوە ⬡ محرمانه، بماند

**entrepôt** /ˈɒntrəpəʊ, US ˈɑːntrəpoʊ/ *noun*

1 ناوەنـدی کـارداری 2 عـەماری ترانزیـت، عـەمارێ کـە کـەل‌وپەلـەکان لـە شـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی تر دەنێـردرێن کـە ڕەنگـە بـۆ ماوەیـێ هەڵبگیرێن) ⬡ 1 مرکز بازرگانی 2 انبار ترانزیت

**entrepreneur** /ˌɒntrəprəˈnɜː(r), US ˌɑːn- / *noun*

1 بازرگـان، کـاردار، تـاجر 2 خـاوەن‌کـار، کـارێکهێن، کارڕەخسێن 3 بەرکار، قـەباڵکـار، کۆنتراکتکار ( entrepreneurial /-ˈnɜːriəl/ *adj*: 1 سەربە خاوەن‌کار، خاوەن‌کارییانە 2 مەترسـیکـار؛ entrepreneurially *adv*؛ entrepreneurship *n*؛ entrepreneurism *n*: خاوەن‌کاری، کارێکهێنی، کارڕەخسێنی) ⬡ 1 تاجر 2 کارفرما، کارآفرین 3 پیمانکار

**entresol** /ˈɒntrəsɒl/ *noun*

تەرکی نوهۆمی نێوەڕاست mezzanine ⬡ کف میان‌اشکوب

**entropy** /ˈentrəpi/ *noun*

1 (فیزیک) ئینتروپی 2 شێواوی، تاریکی، پشێوی، ئاڵـۆزی، شـلەژاوی، chaos، disorganization (entropic /enˈtrɒpɪk/ *adj*؛ entropically *adv*) ⬡ 1 آنتروپی 2 آشفتگی، نابسامانی، بی‌نظمی

**entrustment** *noun*

پێ‌سپاردن، بە ئەمانەت‌پێدان ⬡ به امانت‌گذاری، سپارش

**entry** /ˈentri/ *noun, pl.* entries

1 ژوورەوەچوون، چوونـەنێو، مـافی چوونـەنێو، دەستووری چوونەنێو: *to be granted/refused entry* 2 درگـا، دەرک، ڕێڕەو، ژوورگە، پێشخان، ڕێژوور، ڕێڕەو، دالان، دەروازە 3 (فەرهـەنگ) مـادە، سەروشـە، مـاک: *an encyclopedia entry* 4 برگـە، بابـەت 5 بەشـداریکـەر، هاتـەنێو 6 نـەیار، هەڤـرک 7 ژمارەی بەشداریکەران، ژمارەی هاتـەنێوان 8 نووسـین، تۆمـار(کـردن) 9 (مـاف) گـرتن، دەس‌بەسـەرداگرتن، داگیرکـردن ⬡ 1 ورود، دخول، اجازه‌ی ورود 2 مدخل 3 مدخل، ماده 4 فقـره 5 شـرکت‌کننـده 6 رقیـب 7 تعـداد شرکت‌کنندگان 8 ثبت 9 تصرف

**entry fee** *noun*

درگانە، ژوورانە، مز یان حەقی چوونەژوورەوە، ئەندامانـە، مـافی چوونـەنێو یـان ئەنـدامێتی (بەئەندام‌بوون) ⬡ ورودیه، حق عضویت

**entryism** *noun*

سیاسەت یان ڕامیاری دزە(کردن)، دزەگەری ⬡ سیاست نفوذی

**entry permit** *noun*

دەستووری هاتنەژووری ⬡ اجازه‌ی ورود

**Entryphone** /ˈentrifəʊn, US -foʊn/ *noun*

ئینتریفۆن، درگاکەرەوە ⬡ انتریفون

**entryway** *noun*

ڕێگای چوونەنێو، ژوورگە، ڕێژوور، دالان، درگا، دەروازە ⬡ ورودی، مدخل

**entwinement** *noun*

لێـک‌ئـالان، لێـک‌ئاڵۆسـکان، لێـک‌پێچـران ⬡ درهم‌پیچیدگی

**enucleate** /ɪˈnjuːklieɪt/ *adjective*

(زیندەناسـی، خانـەیێ) بێ‌نـاوک، بێ‌نێـوک ⬡ بدون هسته

**enucleation** /ɪˌnjuːkliˈeɪʃn/ *noun*

1 نێوکدەرهێنان، لابردنی نێوک، ناوکداماڵین 2 لێکدانـەوە، شـیکردنـەوە، ڕوونکردنـەوە ⬡ 1 بیرون آوردن هسته 2 تفسیر، توضیح

**E-number** *noun*

ئی‌نامبێر، ئی‌ژمارە، ژمارەئی (کۆدی پێچانەوەی خـۆراکی بـە پیتی E بـەپێی دەسـتووری یـەکێتی ئەورووپاوە) ⬡ ای‌نامبر

**enumerable** /ɪˈnjuːm(ə)rəb(ə)l/ *adjective*

دەتوانرێ یەک‌بەیەک بژێردرێ یان بێتەژماردن ⬡ انومرابل

**enumeration** /ɪˌnjuːməˈreɪʃn, US ɪˌnuː-/ *noun*

1 بـاس‌کـردن (دەنـک بـە دەنـک)، هەڵـدان 2 بژاردن، یەک‌بەیەک‌ژمێری، یەکەیەکەژمێری، دەنک‌بەدەنک‌باس‌کردن، هەڵژماردن، ژماردن 3 لیستە ( enumerative /ɪˈnjuːmərətɪv, US ɪˈnuː-/ *adj*: هەڵژمێر، یەک‌یەک‌هەڵدەر) ⬡ 1 ذکر 2 شمارش 3 فهرست

**enumerator** *noun*

هەڵژمێر، یەک‌یەک‌هەڵدەر ⬡ شمارنده

**enunciation** /ɪˌnʌnsiˈeɪʃn/ *noun*

گوکردن، گوتن، وتن، ددان‌پیاهێنان، بە روونی دەربڕین یان وتن، بە ئاشکرایی ڕاگەیاندن، دەربڕین (enunciative *adj*: سەربە گوکردن، دەربڕ، بێژەر؛ enunciator *n*: ڕاگەیێنەر) ۞ تلفظ، بیان، اظهار

**enuresis** /ˌenjʊəˈriːsɪs, US ˌenjʊˈriː-/ *noun*

دەڵەمیزی، میزەچۆڕێ، میزەچۆرکێ، میزنی، کەمەرشلی ۞ عدم اختیار در نگهداری ادرار

**enuretic** *adjective, noun*

*adj* سەربە enuresis *n* کەمەرشل، دەڵەمیز ۞ *adj* وابستە بە enuresis *n* دچار عدم اختیار در نگهداری ادرار

**envelope** /ˈenvələʊp, ˈɒn-, US ˈenvəloʊp, ˈɑːn-/ *noun*

1 بەرگەنامە 2 پەردە، پێست، بەرگ (سروشتی، وەک membrane، shell یان integument)؛ unit membrane لیپۆپرۆتئین پەردەی یەکینە؛ virion داوە کە توێی دەرەوەی هێندێ ڤیریۆنی ۞ 1 پاکت(نامە) 2 لفاف، غشاء، پوشش

**enveloped** *adjective*

داپۆشراو، داپێچراو، داگرتوو، سەرگیراو ۞ پوشیده

**envelopment** *noun*

داپۆشین، پێچانەوە، داپێچان، داگرتن، سەرگرتن ۞ پوشش

**envenomation** *noun*, also envenomization

(چ راست چ خوازە) ژاراوی‌کردن ۞ زهرآلودسازی

**enviable** /ˈenviəbl/ *adjective*

1 بەغیلی‌پێبەر، ئیرەیی‌پێبەر، جێگای بەغیلی، بەغیلی‌لەسەر 2 باش، یەکجارچاک، جێی‌پەسند (enviably /-bli/ *adv*؛ enviableness *n*): بەغیلی‌پێبەرانە، بە شێوەیێ کە مرۆڤ بەغیلی پێ‌دەبا: *(an enviably mild climate)* ۞ 1 حسادت‌برانگیز 2 عالی

**envier** /ˈenvi(r)/ *noun*

لەچەر، بەغیل(ی‌پێبەر)، رەشکن، بەئیرەیی، چاوپێ‌هەڵنەهاتوو ۞ حاسد

**envious** /ˈenviəs/ *adjective*

بەغیل، بەئیرەیی، رەشکن، دەڤبەش، بەغیلانە (enviously /ˈenviəsli/ *adv*: بەغیلانە، لە رووی بەغیلی‌یەوە، بەئیرەیی‌یانە) ۞ حسود، حسودانە

**enviro**, *pl.* enviros = environmentalist

**environment** /ɪnˈvaɪrənmənt/ *noun*

1 مەڵبەند، شوێنەوار، دەوروبەر، دەوروپشت، شوێن: *the political environment* 2 ژینگە: ◊ *the Department of the Environment* ◊ *pollution of the environment damage to the environment* 3 (کامپیوتر) مەڵبەند، شوێنەوار، دەوروبەر: *a desktop development*

**environmentally** /-təli/ (*environment adv*: لەباری ژینگەوە، لە بواری ژینگەوە: - *environmentally damaging*) ۞ 1 محیط 2 محیط زیست 3 (کامپیوتر) محیط

**environmental** /ɪnˌvaɪrənˈmentl/ *adjective*

1 مەڵبەندی، شوێنەواری، دەوروپشتی: *environmental influences* 2 سەربە ژینگە، ژینگەیی: *environmental* ◊ *-ental damage* (environmentaly *adv*) *issues/problems* ۞ 1 محیطی 2 وابسته به محیط زیست

**environmentalism** /ɪnˌvaɪrənˈmentəlɪzəm/ *noun*

1 ژینگەپارێزی، پاراستنی ژینگە 2 (دەروونناسی) مەڵبەندخوازی، مەڵبەندگەری، مەڵبەندبینی ۞ 1 طرفداری از محیط زیست 2 محیط‌گرایی

**environmentalist** /ɪnˌvaɪrənˈmentəlɪst/ *noun*

1 ژینگەپارێز 2 (دەروونناسی) مەڵبەندخواز، مەڵبەندگەر، مەڵبەندبین ۞ 1 طرفدار از محیط زیست 2 محیط‌گرا

**environmentally friendly** *noun*, also environment friendly

بێ‌زیان بۆ ژینگە، ژینگەدۆست، ژینگەپارێز ۞ بدون ضرر برای محیط زیست

**environs** /ɪnˈvaɪrənz/ *noun, pl.*

1 دەورشار، دەوروبەری شار، پاڵشار: *Bokan and its environs* 2 دەوروبەر، سووروپشت، دەوروپشت، دۆرمادۆر، گرد: *people living in the immediate environs of a nuclear plant* ۞ 1 حومه 2 حول و حوش

**envoi** /ˈenvɔɪ/ *noun*, also envoy

(کۆن) وتەی دوایی نووسەر ۞ سخن آخر نویسنده

**envoy** /ˈenvɔɪ/ *noun*, also envoi

1 نێردراو، راسپاردە: *The President has suggested sending a US peace envoy to the Middle East* 2 نوێنەری حکومەت 3 (کۆپلە) هۆنراوەی کۆتایی کتێب، دوایین وتە 4 (هەروەها envoy extraordinary) = minister ۞ 1 فرستاده 2 نمایندەی دولت 3 شعر ختامی

**envy** /ˈenvi/ *noun*, also envies

ئیرەیی، بەغیلی، رەشک، سوو، چاوپێ‌هەڵنەهاتوویی، لەچەری، مایەی بەغیلی: *They looked with envy at her latest purchase* ◊ *He couldn't conceal his envy of me* ۞ حسادت، رشک، اسباب حسادت

**envyingly** /ˈenviɪŋli/ *adverb*

بەغیلانە، لە رووی ئیرەیی‌یەوە یان بەغیلی‌یەوە ۞ از روی حسادت

**Enzed** /enˈzed/ *noun*

(ئەوسترالیا و نیوزیلەند، نافەرمی) نیوزیلەند و نیوزیلەندی (Enzedder *n*) ◌ زلاندنو وزلاندنوی
**enzootic** /ˌɛnzəʊˈɒtɪk/ *noun, adjective*
ئێنزۆتیک، ئازار (نەخۆشی: تایبەتی گیانەوەرانی ناوچەیی یا لە وەرزێکی تایبەتیدا) ◌ انزوتیک
**enzygotic** *adjective*
لێکچوو، وەکیەک، هاوشێوە (دوانە) ◌ مشابه، همانند
**enzyme** /ˈenzaɪm/ *noun*
ئێنزایم، ئانزیم، هەوێنە، ترشێنە (بنەڕەت: لە *Enzym* ئەڵمانی، لە *enzumos* یۆنانی نوێوە "leavened") ◌ آنزیم، دیاستاز
**enzymic** *adjective*, also enzymatic
ئانزیمی، هەوێنەیی، ترشێنەیی، سەربە یان بەرهەم هاتوو لە هەوێنەکان، پێوەندی بە هەوێنەکانەوە هەیە ( enzymic or enzymatically *adv*) ◌ وابسته به آنزیم
**enzymology** *noun*
هەوێنەناسی، ترشێنەناسی، ئانزیمناسی (enzymologist *n* ؛enzymological *adj*: هەوێنەناس، ترێنەناس، ئانزیمناس) ◌ آنزیم‌شناسی
**eo-** *prefix*
پێشگر: شەبەق، بەرەبەیان، سەرەتاترین، زوو، کۆنترین، سەرەتا: *Eocene*، *eohippus*، *eolithic* (بنەڕەت: لە *ēos* یۆنانی "dawn") ◌ پیشوند: فجر، قدیم‌ترین
**Eocene** /ˈiːə(ʊ)siːn/ *adjective*
زوونوێ، ئیۆسین، ئیۆسین (= یەکەمین قۆناخی سەردەمانی ژیانی نوێ Cainozoic era یان سەردەمی سێیەمی زەویناسی سەربە 56.5 تا 35.4 (نێوان قۆناخەکانی Palaeocene و Oligocene) میلیۆن ساڵ لەوە پێش. لەم قۆناخەدا چالاکی گڕکانی زۆر بووە و زۆر باتنایی سەربەو قۆناخە لە تەواوی گڕکانی داپۆشراوە و هەروەها لەو قۆناخەدا یەکەم ئەسپەکان، شەمشەکوێرەکان و نەهەنگەکان پەیدابوون) ◌ ائوسن
**eocene** /ˈiːə(ʊ)siːn/ *adjective*
بووڵێڵەیی، شەبەقی، سەربە بەرەبەیان ◌ وابسته به فجر
**eohippus** /ˌiːəʊˈhɪpəs/ *noun, pl.* eohippuses = hyracotherium
**eo ipso** /ˌeɪəʊ ˈɪpsəʊ/ = thereby
**eolian** = aeolian
**eolith** /ˈiːə(ʊ)lɪθ/ *noun*
زووبەردە: جۆری بەرد لە چینەکانی Tertiary (eolithic *adj*) ◌ ایولیت
**EOM** *abbreviation* end of message
کۆتایی پەیام (لە ئیمەیلدا بەکاردێت) ◌ پایان پیام
**eon** = aeon
**Eos** *noun*, Greek *Ēōs*
ئیۆس، خواژنی بووڵێڵە (لە میسۆلۆژی یۆنانیدا، بڕوانە Aurora) ◌ ائوس
**eosin** /ˈiːə(ʊ)sɪn/ *noun*, also eosin
1 جۆری رەنگی کریستاڵی سوور $C_{20}H_8Br_4O_5$، بەرهەمێکی برۆمینی fluorescein ـە 2 هەر رەنگێکی وا (eosinic *adj*) ◌ ائوزین
**eosinophil** /ˌiːə(ʊ)ˈsɪnəfɪl/ *noun*, also eosinophile
ئیۆسیندۆست: 1 هەر شانە یا ماکێکی زیندەوەری کە کاتێ بەر ئیۆسین کەوێ رەنگ دەگرێ 2 خڕۆکە سپییەکان کە دەنکۆڵەی تیایە ( eosinophilic یان eosinophilic or eosinophilous *adj*) ◌ ائوزینفیل
**eosinophilia** /ˌiːə(ʊ)ˌsɪnəˈfɪlɪə/ *noun*
بوونی ژمارەیێکی نائاسایی eosinophil ـەکان لە خوێندا ◌ ائوزینفیلیا
**-eous** = -ous
**EP** *abbreviation* extended play
**EPA** *abbreviation* 1 Environmental Protection Agency 2 (Chemistry) eicosapentaenoic acid
(لە ئەمریکا) ئاژانسی پاراستنی ژینگە ◌ اپا
**epact** /ˈiːpakt/ *noun*
جیاوازی ساڵی خۆری سەبارەت بە ساڵی مانگی ◌ عشرەی مسترقه
**eparch** /ˈɛpɑːk/ *noun*
سەرقەشەی هەرێمی کلێسەی ئۆرتۆدۆکس ◌ اسقف شهرستان
**eparchy** /ˈɛpɑːki/ *noun, pl.* eparchies
هەرێمی کلێسەی orthodox (eparchial *adj*) ◌ شهرستان کلیسای ارتدکس
**epauliere** *noun*
(لە فەرەنسەوە، سەربازی) سەرشان ◌ سردوشی
**epaulette** /ˈepəlet/ *noun*, US also epaulet
(لە فەرەنسەوە) زرێی شان، شانەوانە ◌ زره شانه
**epaxial** /ɛˈpaksɪəl/ *adjective*
(توێکاری و گیانەوەرناسی) هەڵکەوتوو لە لای پشتەوەی تەوەرێ ◌ اپاکسیال
**épée** /eˈpeɪ, US ˈepeɪ/ *noun*
شیر، شمشێر (لە شیرەوانیدا؛ épéeist *n*: شیرباز، شمشێرباز، شمشێرەوان) ◌ شمشیر
**epeirogenesis** *noun*
وشکانی پێکهاتن، چاڵی‌وچۆڵی‌دروس‌بوون ◌ خشکی‌زایی
**epeirogenesis motions** *noun, pl.*
جووڵەکانی وشکانی پێکهاتن ◌ حرکات خشکی‌زایی
**epeirogeny** *noun*
ئێپیرۆژێنی (= گۆڕان بەسەرهاتنی توێکڵی

زەوی؛ epeirogenic *adj*: سەربە یان پێوەندی بە ئێپیرۆژێنییەوە هەیە) ◌ ایپروژنی

**epencephalon** /ˌepənˈsefəːɒn/ *noun*
پاشەمێشک، پاشەدەماغ، ئێپێنسێفالۆن ◌ دماغ صغیر

**epenthesis** /eˈpɛnθɪsɪs/ *noun, pl.* epentheses /-siːz/
تێترنجاندن، تێخستن، خستنەنێو (دەنگ یا پیتێ کە بخرێتە ناو یەیکەر و لاشەی وشەیێ (وەک *b* لە *thimble* یان کاتێ سپانیاییەکان فێری ئینگلیسی دەبن زۆربەیان وشەی *speak* بە شێوەی /espiːk/ گۆ دەکەن، چونکو زمانەکەیان ئەو هێشووی نەبزوێتەکانی consonant cluster نییە /sp/)؛ epenthetic *adj*: تێترنجاو، تێخراو، تێترنجێنراو؛ بنەڕەت: لە یۆنانییەوە، لە *epentithenai* "تێخستن") ◌ درج، صوت‌افزایی

**epergne** /ɪˈpəːn/ *noun*
خشڵێکی جوانی نێوەڕاستی مێز، گوڵ یان میوەی تیابوو ◌ اپین

**epexegesis** /ɛˌpɛksɪˈdʒiːsɪs/ *noun, pl.* epexegeses /-siːz/
ڕوونکردنەوە (ئەو وشە یان ئەو وشانەی کە بۆ ڕوونکردنەوەی وشە یان ڕستەی پێشوو خراونەتەسەر؛ epexegetic /-ˈdʒɛtɪk/ or epexegetical /-ˈdʒɛtɪkl/ *adj*؛ epexegetically *adv*) ◌ توضیح

**Eph.** Epistle to the Ephesians (in biblical references).

**ephebe** /ɛˈfiːb, ɪ-, ˈɛfiːb/ *noun*
(لە یۆنانی کۆندا) لاوی تەمەن 18-20 سالان کە ڕاهێنانی سەربازی دەکەوتە سەرشان (ephebic *adj*) ◌ افب

**ephedra** /ɛˈfɛdrə/ *noun*
دەوەنێکی تەرزفرێدەری ناوچە گەرم و وشکەکان، چەند جۆرێکی وەک سەرچاوەی دەرمانی ephedrine وایە [توخم *Ephedra*] ◌ افدرا

**ephedrine** /ˈɛfədriːn/ *noun*
ئێفیدرین: دەرمانێکی $C_{10}H_{15}NO$ alkaloid کە دەبێتە هۆی تەنگبوونەوەی ڕەگەکانی خوێن و هەراوکردنەوەی ڕێگا و کانالی برۆنکیال ◌ افدرین

**ephemera** /ɪˈfemərə/ *noun, pl.*
1 گوڵی یەکڕۆژە 2 مێرووی یەکڕۆژە 3 شتە سەردەمییەکان، شتە کورتماوەکان، شتە کەمخایەنەکان 4 (پزشکی) تای یەکڕۆژە ◌ 1 گل یکروزە 2 حشرەی یکروزە 3 چیزهای ناپایدار 4 تب یکروزە

**ephemeral** /ɪˈfemərəl/ *adjective*
ماوەکورت، کورتماوە، سەردەمی، تێژپەڕ، ڕۆژەکی، زوولەنێوچوو، نابەردەوام، کورتخایەن: *ephemeral pleasures* (زۆرتر لەمەڕ ڕووەکەکان) سووڕی ژیانی زۆر کورتیان هەیە، ماوەکورت، کورتماوە (ephemerality *n*؛ ephemerally /ɪˈfemərəli/ *adv*: ماوەکورتانە، ڕۆژەکییانە، زوولەنێوچووانە، کورتخایەنانە) ◌ زودگذر، گذرا

**ephemeralness** *noun*
ماوەکورتی، کورتماوەیی، سەردەمێتی، تێژپەڕی، ڕۆژەکێتی، زوولەنێوچوویی، کورتخایەنی ◌ زودگذری، گذرایی

**ephemerid** /ɪˈfɛmərɪd/ *noun*
مێرووی ڕۆژەکی یان یەکڕۆژە ◌ حشرەی یکروزە

**ephemeris** /ɪˈfɛm(ə)rɪs, US -ˈfiːm-/ *noun, pl.* ephemerides /ˌɛfɪˈmɛrɪdiːz/
1 (ئەستێرەوانی) زیگ، ساڵنامەی گەردوونی، خشتەی ئەستێرەوانی، ڕۆژمێری ئاسمانی 2 مێرووی یەکڕۆژە ◌ 1 زیج 2 حشرەی یکروزە

**ephemeron** *noun*
شتی زوولەنێوچوو یا سەردەمی، شتی تێژپەڕ یا یەکڕۆژە ◌ شی زودگذر

**Ephemeroptera** /ɪˌfɛməˈrɒptərə, US -ˌfiːm-/ *noun, pl.*
مێرووە زوومر یان کەمژیاوەکان (mayflyیەکان دەگرێتەوە) ◌ افمروپترا

**ephemeropteran** *noun, adjective*
(مێرووی) زوومر یان کەمژیاو، کەمتەمەن، تەمەنکورت ◌ افمروپتران، زودمیر

**Ephesians** *noun, pl.*
نامەیێ بۆ کریستیەنە سەرەتاکان و کتێبێکە سەربە پەیمانی نوێ ◌ آفسینس

**ephod** /ˈiːfɒd, US ˈɛfɒd/ *noun*
(لە ئیسرائیلی کۆندا) کراسی بێقۆڵی قەشەکانی جوو ◌ افود

**ephor** /ˈɛfɔː/ *noun*
(لە یۆنانی کۆندا) یەکێ لەو پێنج کەسی بەرزی سپارتی Spartan چاودێری کاروباری شا (ephorate *n*) ◌ افور

**Ephraim** *noun*, Hebrew *Ephrayim*
ئێفرائیم، ئێفرایم: کوڕی Joseph و سەرڕەچەڵەکی یەکێ لە خێڵەکانی ئیسرائیل (Ephraimite *n*: 1 ئەندامی خێڵێکی عیبری ئێفرائیم 2 ڕەسەن یا دانیشتووی شانشینی باکووری ئیسرائیل (بەپێی کتێبی پیرۆز) ◌ آفرائیم

**epi-** *prefix*
پێشگر: لەسەر، زوور، بان، سەر، دەرەوەیی، دەرەکی، (لە)پاڵ، تەنیشت، سەرەڕای، سەرباری: *epiphenomenon* (بنەڕەت: لە *epi* یۆنانییەوە "upon") ◌ پیشوند: روی، فوق، فرا، بیرونی، کنار، باوجود

**epibenthos** *noun*

ژووربنژی(یان، کەمێ سەرتر لە بنی دەریا دەژین) ۞ اپی‌بتوس

**epiblast** /'ɛpɪblast/ *noun*
تـــــــوێی دەرەوەی blastoderm، ectoderm (epiblastic *adj*) ۞ اپی‌بلاست

**epiboly** *noun, pl.* epibolies
سەرڕووان: ڕووانی بەشێ لەسەر بەشێکی تر (epibolic *adj*) ۞ اپی‌بولی

**epibranchial** *adjective*
ژوورشیپەڕەیی ۞ اپی‌برانکیال

**epic** /'epɪk/ *noun, adjective*
*n* 1 پالەوانی، قارەمانی: *one of the great Hindu -s* 2 فیلمی قارەمانی یان پالەوانی 3 چیرۆکی پالەوانی *adj* پالەوانی، قارەمانی، پالەوانانە، قارەمانانە؛ epical /'epɪkl/ *adj*: پالەوانی، قارەمانی؛ epically *adv* (بنەڕەت: بە ڕێگـای لاتـین لـە *epikos* یونـانی، لـە *epos* "song، word") ۞ *n* 1 حماسە 2 فیلم حماسی 3 داستان حماسی *adj* حماسی، قهرمانی، قهرمانانه

**epicalyx** *noun, pl.* epicalyxes or epicalyes
(ڕووەکناسی) لاپـوورگ، ژێرکاسـە(لـە) ۞ کاس‌برگ فرعی

**epicanthus fold** *noun,* also epicanthus, *pl.* epicanthi
چـینی ژوورقنچـک (ب.ت. لـەنێـو گـەلانی ئاسیایی‌دا) ۞ اپی‌کانتوس

**epicardium** /ˌɛpɪ'kɑːdɪəm/ *noun, pl.* epicardia
ژوورپـەردەی دڵ: پـەردەی پێکهێنـەری تـوێی هـەرەنێوەوەی pericardium (epicardial or epicardiac *adj*: سـەربە epicardium) ۞ اپیکاردیوم

**epicarp** *noun*
تـوێی هـەرەدەرەوەی pericarp، وەک تـوێخی هێندێ میوە ۞ اپی‌کارپ

**epicedium** /ˌɛpɪ'siːdɪəm/ *noun*
چەمەری، سەردولکە، شینامە (epicedian *adj*) ۞ مرثیه

**epicene** /'epɪsiːn/ *adjective, noun*
*adj* 1 نێرەمووک، دووڕەگەزە، نەنێرنەمێو 2 ـ effete *n* کەسێکی نێرەمووک ۞ *adj* مخنث *n* آدم مخنث

**epicentre** /'epɪsentə(r)/ *noun,* US epicenter
1 ناوەنـدی بوومەلـەرزە، چـەقی‌لـەرزە، چـەقی بوومەلەرزە 2 ناوەند، خاڵی ناوەندی، جەرگە، مەکۆ (epicentral *adj*) ۞ 1 مرکز زمین‌لرزه 2 مرکز، کانون، نقطه‌ی مرکزی

**epichlorohydrin** *noun*
جۆرێ ئێپۆکسایدی ژاراوی هەڵمیو $C_3H_5ClO$ ۞ اپی‌کلروهیدرین

**epicotyl** /ˌɛpɪ'kɒtɪl/ *noun*
(ڕووەکناسی) ژووریەل: ناوچەی embryo یان لاسکی چەکەرە لە ژوور cotyledon ۞ اپی‌کوتیل

**epicritic** /ˌɛpɪ'krɪtɪk/ *adjective*
(کارئەندامناسی) گەرما و سەرما لێکدەکاتەوە ۞ ممیز

**epicure** /'epɪkjʊə(r), US -kjʊr/ *noun*
کـەسـێکی خـۆش‌ڕابـوێر، خۆشـخۆر ۞ آدم عشرت‌طلب، خوش‌خوراک

**epicurean** /ˌepɪkjʊə'riːən, US ˌepɪkjʊ'r-/ *adjective, noun*
*adj* 1 خۆش‌گوزەران، خۆش‌ڕابوێر، ئێپیکۆری، خـۆش‌خـۆر 2 ئێپیکـۆری، خۆشـی‌بـاوەڕ *n* 1 (Epicurean) شاگرد یا خوێندکاری فیلسووفی یونانی (Epicurus 341–270 پێش‌زایین) 2 کەسێکی خۆش ڕابوێر یان خۆش‌گوزەران ۞ *adj* 1 لـذت‌پرسـت، اپیکـوری، خـوش‌خـوراک 2 عشرت‌طلب *n* 1 اپیکوری 2 آدم عیاش

**epicureanism** /ˌepɪkjʊə'riːənɪzəm, US ˌepɪkjʊ'riːən-/ *noun*
1 فـەلـسـەفـەی ئێپیکـۆر، ئێپیکۆرباوەڕی، ئێپیکۆرخوازی، ئێپیکۆریزم 2 خۆش‌گوزەرانی، خـــۆش‌ڕابـــوێری (epicureanist /ˌepɪkjʊə'riːənɪst, US ˌepɪkjʊ'riːən-/ *n*) ۞ 1 اپیکورگرایی 2 لذت‌پرستی

**epicurean school** *noun*
ڕێباز یان قوتابخانەی ئێپیکۆری ۞ مکتب اپیکوری

**epicurism** *noun*
خۆش‌گوزەرانی، خۆش‌خۆری، خۆش‌ڕابوێری ۞ عشرت‌طلبی

**epicuticle** *noun*
ژوورتوێژە: دەرترین تـوێی مێـوی و ناسـکی ئێسـک‌بەندی دەرەوەی exoskeleton مێروویێ (epicuticular *adj*) ۞ اپی‌کیوتیکل

**epicycle** /'ɛpɪˌsʌɪk(ə)l/ *noun*
(ئەندازە) بازنەیێکی چکۆلانە کە ناوەندەکەی بە دەوور دانـەیێکی گـەورەترا دەسـووڕێتەوە (epicyclic *adj*) ۞ اپی‌سیکل

**epicycloid** /ˌɛpɪ'sʌɪklɔɪd/ *noun*
(ماتماتیک) ئێپی‌سایکلۆید (epicycloidal *adj*) ۞ اپی‌سیکلوید

**epidemic** /ˌepɪ'demɪk/ *noun, adjective,* also epidemical
*n* 1 نەخۆشی پەتایی، نەخۆشی درمی، درم، پەتا، کولـک، پـەژێک 2 بلاوبوونـەوە، تەنینـەوە، باوبوون، بەبرەوی *adj* پەتاناسا، پەتایی، درم‌ئاسا ۞ *n* 1 بیماری همه‌گیر 2 شیوع، رواج *adj* همه‌گیر

**epidemiology** /ˌepɪˌdiːmi'ɒlədʒi, US -'ɑːl-/ *noun*
پەتاناسـی، درمناسـی (epidemiological /ˌepɪˌdiːmiə'lɒdʒɪkl, US -'lɑːdʒ-/ *adj*:

درمناسـیـیانـه، سـەربە درمناسی؛ epidemiologist /ˌepɪˌdiːmiˈɒlədʒɪst, US -ˈɑːl-/ n: پەتا یا درمناس) ◌ همه‌گیرشناسی

**epidendrum** *noun*

ژووردارە: جـۆری گیاسـارمە [تـوخم *Epidendrum*] ◌ اپی‌دندروم

**epiderm(o)-** *prefix*

پێشگر: توێژ، توێخ، رووپێست، پێستی دەرەوە (بنـەڕەت: لـە *epi* یۆنـانی "upon" + *derma* "skin") ◌ پیشوند: بشره، روپوست

**epidermis** /ˌepɪˈdɜːmɪs, US -ˈdɜːrm-/ *noun*

تـوێخ، تـوێژ، رووپێـست، بـەری پێـست (epidermal or epidermi *adj*: تـوێخین، تـوێخی، تـوێژی، رووپێـستی؛ epidermoid /ˌepɪˈdɜːmɔɪd/ or epidermoidal *adj*: شێوەتوێژ، توێخئاسا، توێژین) ◌ روپوست، بشره

**epidiascope** *noun*

چرای وێنە، چراوێنە ◌ چراغ عکس

**epidural** /ˌepɪˈdjʊərəl, US -ˈdʊr-/ *noun, adjective*

(بەنگ یان دەرمانی بێهۆش‌کەر) دەرزی‌لێدان لە برِبرِە ◌ اپی‌دورال

**epididymis** /ˌɛpɪˈdɪdɪmɪs/ *noun, pl.* epididymides /ˌɛpɪdɪˈdɪmɪdiːz/

ژووربـاتوو، ژوورگونـان، پاشـکۆی بـاتووان (epididymal *adj*: ژووربـاتوویی، سـەربە epididymis) ◌ ضمیمه‌ی بیضه

**epidote** /ˈɛpɪdəʊt/ *noun*

کـانیکی سـەوزی زەردی درەوشـاوە $Ca_2(Al,Fe)_3Si_3O_{12}OH$، سیلیکاتی کالسیۆم، ئالومینیۆم و ئاسنی تیایە ◌ اپیدوت

**epidural** /ˌɛpɪˈdjʊər(ə)l/ *adjective*

لـە ژوور یـان دەورووبـەری dura mater ی برِبرِەی مۆخ ◌ اپیدورال

**epifauna** *noun*

ئەو گیانـەوەرە ئـاوی‌یانـەی کـە لەسـەر عـەرز، لەسەر رووەک و شتی سەرئاوکەوتوودا دەژین (بروانە infauna؛ epifaunal *adj*) ◌ اپی‌فونا

**epigamic** *adjective*

شـێوەی تایبـەتی گیانـەوەری بـۆ راکێـشانی جووتـەکـەی، وەک رەنگـی پـەڕوبالـی (کـە دەدرەوشێتەوە) ◌ اپی‌گامیک

**epigastrium** /ˌepɪˈgastrɪəm/ *noun, pl.* epigastria /-rɪə/

(توێکـاری) ژوورگـەدە، سـەر(وو)گـەدە، ژوورمێعـدە، سـەرەوەی گـەدە (epigastric /ˌepəˈgæstrɪk/ *adj*) ◌ فوق‌المعده

**epigeal** /ˌɛpɪˈdʒiːəl/ *adjective*, also epigean

(رووەک‌ناسـی) لەسـەر عـەرزەوە شـین دەبـێ، سەرعەرزی ◌ اپیجال

**epigene** /ˈɛpɪdʒiːn/ *noun*

ئێپیـژین، سـەرزەوی (پێکهـاتوو لـە سـەرووی زەوی) ◌ اپیژن

**epigenesis** /ˌɛpɪˈdʒɛnɪsɪs/ *noun*

(زیندەناسی) دروستبوونەوەی تۆو سـەرلەنوێ ◌ اپیژنیز، اپیژنسیس

**epigenetic** *adjective*

1 سـەربە دروسـتبوونـەوەی تـۆو سـەرلەنوێ 2 (زەوی‌ناسـی) پـاش بـەردەکانی بنـەوە یـان دەورووبەری پێکهاتووە ◌ وابسته به اپیژنیز

**epiglottis** /ˌepɪˈglɒtɪs, US -ˈglɑːtɪs/ *noun*

زمانەچکۆلـە، زمانۆچکـە، قورقوراگـەپۆش (epiglottal or epiglottic *adj*) ◌ دریچه‌ی نای

**epigone** /ˈɛpɪɡəʊn/ *noun, pl.* epigones or epigoni /ɪˈpɪɡənʌɪ, ɛ-/

لاسایی‌کەرەوە یان پاش‌ڕەوی بەرهەمێ (وێژەیی یـا هونـەری، epigonic or epigonous *adj*; epigonism *n*) ◌ اپیگون

**epigram** /ˈepɪgræm/ *noun*

گالـتە، نوکتـە، قـسەی نەسـتەق، فـڕ (epigrammatic /ˌepɪgrəˈmætɪk/ or epigrammatical *adj*: گالـتەیانە، فـڕاوی، نوکتەبێژانـە؛ epigrammatist *n*: گالـتەبێژ، نوکتەبێژ، فڕوێژ، قسەنەستەق) ◌ لطیفه، طنز

**epigraph** /ˈepɪgrɑːf, US -græf/ *noun*

1 نووسـراوە (ی هـەڵکۆڵـراو، لەسـەر خـانوو، کۆین، پەیکەر و...)، ئێپیگراف: *The epigraph to the chapter read: 'One man's freedom is another man's slavery'* 2 دروشـم 3 سەرنووسراوە ◌ 1 کتیبه 2 شعار 3 سرلوحه

**epigraphy** /ɪˈpɪgrəfi, US ɛ-/ *noun*

نووسـراوەناسـی (epigraphic /ˌɪpɪˈgræfɪk, US ɛ-/ or epigraphical /-kl/ *adj*: سـەربە نووسـراوە، نووسـراوەیی؛ epigraphist or epigraphe *n*: زانـای نووسـراوەکان، لێکۆڵـەری نووسـراوەکان؛ epigraphically /ˌɪpɪˈgræfɪkli, US ɛ-/ *adv*) ◌ کتیبه‌شناسی

**epigynous** /ɪˈpɪdʒɪnəs, US ɛ-/ *adjective*

(رووەک‌ناسی) ژوورنێرکە، سەرنێرکە (epigyny *n*) ◌ اپیجینوس

**epilepsy** /ˈepɪlepsi/ *noun*

فـێ، پەرکـەم، عـەدر، سـەرڕودڵ (بنـەڕەت: لـە *épilepsie* فەرەنسەوە یان لە ڕێگای late Latin لـە *epilēpsia* یۆنـانی، لـە *epilambanein* "دەس‌بەسەراگرتن، گرتن، پەلاماردان") ◌ صرع

**epilept(i,o)-** *prefix*

پێشگر: فـێ، پەرکـەم: *epileptoid* ◌ پیـشوند: صرع

**epileptic** /ˌepɪˈleptɪk/ *adjective, noun*

*adj* فێ‌دار، سـەربە فـێ: *an* ◊ *an epileptic fit* *n* *epileptic seizure* نەخۆشـی فێ‌دار: *Is she*

*adj* ۞ (epileptically *adv*) *an epileptic?* صرعی *n* بیمار صرعی

**epileptic fit** *noun*
لێهاتنی فێ، فێلێهاتن ۞ حملەی صرعی

**epileptiform** *adjective*
شێوەفێ ۞ شبەصرع

**epileptoid** *adjective*
1 شێوەفێ، 2 epileptiform خاوەنی ئەو کۆنیشانەیە کە شێوەی فێ دەدا: *the epileptoid person* ۞ اپی‌لپتوید

**epilimnion** /ˌɛpɪˈlɪmnɪən/ *noun, pl.* epilimnia /-nɪə/
زوورگۆماوژە: توێی سەرەوەی ئاو لە گۆماوێکی چین‌چیندا (لەگەڵ hypolimnion بەراورد کری)؛ epilimnetic or epilimnial *adj*؛ بنەڕەت: -epi + *limnion* یونانی (چکولێنراوی *limnē* "گۆماو lake") ۞ اپیلمنیون

**epilogue** /ˈɛpɪlɒg, US -lɔːg, -lɑːg/ *noun,* US epilog
پاشەکی، پاش(ە)نووس، کۆتایی، کۆتایی‌نامە ۞ خاتمە، مؤخرە

**epimerase** *noun*
هەوێنەیێ کە وەک تاوەدەرێ لە راگوێستنی کۆمەڵێکی هایدرۆکسیل لە جێ‌یێکەوە بۆ جێ‌یێکی تر لە زوور گەرد molecule کار دەکا ۞ اپی‌مراز

**epimer** /ˈɛpɪmə/ *noun*
زووربارژە: هەریەک لەو دوو stereoisomer کە لە ریکخستن و شێوەدا جیاوازن (-epimeric /) ۞ (-rism /ɪˈpɪm-, ɛ-/ *n* ؛ˈmɛrɪk/ *adj* اپی‌مر

**epimorphosis** *noun*
نوێ‌بوونەوەی بەشێ لە زیندەوەر یان تەواوی بەهۆی زۆربوونی کوت‌وپڕی خانەکان و دابەش‌بوونیان؛ سازبوونەوەی بەشێ لە لەش بەهۆی زۆربوونی خانەکان لە شوێنێکی بڕدراو ۞ اپی‌مورفوز

**epimysium** *noun, pl.* epimysia
زوورماسوولکە: بەرگی دەرەوەی ماسوولکەی هێلاوی ۞ اپی‌میسیوم

**epinasty** *noun*
زوورچەمانەوە، زوورچەمی (epinastic *adj*) ۞ اپی‌ناستی

**epinephrine** /ˌɛpɪˈnɛfrɪn, -riːn/ *noun,* also epinephrin
1 هۆرمۆنی ئادرینالین 2 ئامادەکردنی بازرگانی ئەم مەتریالە، زۆرتر وەک هاندەری دڵ و antiasthmatic بەکاردێنرێ ۞ اپی‌نفرین

**epineurium** *noun, pl.* epineuria
زووردەمار (epineurial *adj*) ۞ اپی‌نوریوم

**epinician** /ˌɛpɪˈnɪsɪən/ *adjective*
سەربە هۆنراوەی ئاوازینی یۆنانی کۆن بە بۆنەوەی سەرکەوتنەوە ۞ اپینیسین

**epipelagic** *adjective*
سەربە ناوچەیێ لە ئۆقیانووس کە رووناکی تەواوی تێ‌دەکەوێ تا رۆشنەپێکهاتن photosynthesis لەوێ روو بدا ۞ اپی‌پلاجیک

**Epiphany** /ɪˈpɪfəni/ *noun, pl.* epiphanies
1 جەژنی دەرکەوتن (مەسیح، لە 6ی ژانویە) 2 (epiphany) سەرهەڵدان، دەرکەوتن (epiphanic *adj*) ۞ 1 عید ظهور 2 ظهور

**epiphenomenalism** *noun*
تیۆری ئێپیفێنۆمێنالیزم، لادیاردەگەری (epiphenomenalism *n*) ۞ نظریەی پدیدار ثانوی

**epiphenomenon** /ˌɛpɪfəˈnɒmɪnən/ *noun, pl.* epiphenomena /-nə/
لادیاردە، لادەرکەوتە، نیشانەی دوایی، کاریگەری دواتر، کۆنیشانەی دواتر ( epiphenomenal *adj*) ۞ پدیدار ثانوی، علائم ثانویە

**epiphora** /ɪˈpɪf(ə)rə/ *noun*
1 (یەکجار) ئاوکردنی چاو، ئاوەچۆڕەی چاو 2 another term for epistrophe(Rhetoric) - ۞ آب‌ریزش چشم

**epiphysis** /ɪˈpɪfɪsɪs, US ɛ-/ *noun, pl.* epiphyses
1 بەشی دوایی ئێسکێکی درێژ 2 رژێنەی سنەوبەری، کاژەرژێن، pineal gland (epiphyseal or epiphysial *adj*) ۞ 1 اپیفیز 2 غدەی صنوبری

**epiphyte** /ˈɛpɪfʌɪt/ *noun*
ئێپیفیت، زوورگیا(یی)، سەرووڕووەکی، رووەکی هەوایی (epiphytic(al) /-ˈfɪtɪk/ *adj*) یان (epiphytism *n* ؛epiphytal /-ˈfʌɪt(ə)l/ ۞ اپیفیت

**epiphytology** *noun*
زانستی نەخۆشی‌یەکانی رووەک، ئازارناسی ۞ اپیفیتولوژی

**epiphytobios** *noun*
زوورگیازی، سەرڕووەکزی، زووڕرووەکزی ۞ روگیازی

**epiphytotic** *adjective, noun*
*adj* (نەخۆشی‌یەکان) گیائازار (ژمارەیێکی زۆری رووەک لە ناوچە و لە کاتێکدا تێوەدەدا) *n* نەخۆشی گیائازار ۞ اپی‌فیتوتیک

**epipleural** *adjective*
زووربەراسوویی، سەربەراسوویی ۞ رودندەای

**episcia** *noun, pl.* episcias
زوورسێبەرە: گیایێ لە تۆخمی (*Episcia*) ئەمریکای گەرمێنان و پێوەندی بە وەنەوشەی ئەفریکایی‌یەوە African violet هەیە ۞ نوعی گیاه

**episcopacy** /ɪˈpɪskəpəsi/ *noun, pl.*

episcopacies
1 پلەوپایــەی سەرقەشــەیتی 2 ســەردەم یــان قۆنــاخی سەرقەشــەیتی 3 سەرقەشــەکان، ئۆسقۆفەکان (ب.ت. لە کلێــسەی ئەنگلیکان لە ئەمریکا و سکاتلەند دا) ۞ 1 مقــام اســقفی 2 دورەی اسقفی 3 اسقف‌ها

**episcopal** /ɪˈpɪskəpl/ *adjective*
سەرقەشەیی، ئۆسقۆفی، گەورەقەشەیی، سەربە سەرقەشــــە(کــــان) (episcopally *adv*؛ episcopalism *n*) ۞ اسقفی، وابسته به اسقف(ها)

**Episcopal Church** *noun*
کلێــسەی سەرقەشــەیی یــان ئێپیــسکۆپال ۞ کلیسای اپیسکوپال

**Episcopalian** /ɪˌpɪskəˈpeɪliən/ *noun, adjective*
*n* ئەندامی کلێــسەی ئێپیــسکۆپال، شوێنکەوتووی کلێــسەی ئێپیــسکۆپال *adj* ســەربە کلێــسەی ئێپیسکۆپال ۞ *n* عضو کلیــسای اپیــسکوپال، پیــرو کلیــسای اپیــسکوپال *adj* وابسته به کلیسای اسقفی

**episcopate** /ɪˈpɪskəpət/ *noun*
1 دەســتەی سەرقەشــەکان یــان ئۆســقۆفەکان 2 پۆستی سەرقەشەیی ۞ 1 هیأت اسقفان 2 منصب اسقفی

**episitotomy** /ɪˌpiːsiˈɒtəmi, US -ˈɑːtəmi/ *noun, pl.* episitotomies
(پزشکی) بڕینی پێرینیۆم، شەرمبڕی ۞ برش فرج

**episode** /ˈepɪsəʊd, US -soʊd/ *noun*
1 ڕووداو، بوویــەر، قــەومین، دیمــەن 2 بــەش، پشک (سینەما، چیرۆک و شانۆ) 3 بەشێ نێوان دوو گۆرانی choric لە تراژیدی یۆنانی‌دا ۞ 1 رویداد، واقعه، صحنه 2 قسمت 3 اپیسود

**episodic** /ˌepɪˈsɒdɪk, US -ˈsɑːd-/ *adjective,* also episodical
1 پچڕپچڕ، بــەش‌بــەش، جارناجــار، ناوەنــاوە، تاک‌وتووک، ناڕێک، ناڕێک‌وپێک 2 ڕووداویی، ســەربە ڕووداو یــا بوویــەر، پێکهاتوو لــە زنجیرە ڕووداوێــک، کۆمەڵــە ڕووداوێکــی تیایــە (episodically *adv*: ناڕێــــک‌وپێکانــــە، پچڕپچڕانە) ۞ 1 پراکنــده، نــامنظم، جزءجــزء 2 وابسته به واقعه

**episome** /ˈɛpɪsəʊm/ *noun*
ژوورتــەن: تــوخمێکی بۆمــاوەیــی genetic element نێــو هێنــدێ خانــەی بــەکتریــایی کــە دەتوانن لەخۆهەڵگرنەوە (یا زاوزێ بکەن، وەک bacterial plasmid؛ episomal *adj*، episomally *adv*) ۞ اپیــوم

**epistasis** /ɪˈpɪstəsɪs/ *noun, pl.* epistases
ڕاگــیران، ئێپیــستاسیس: دامرکــانی کاریگــەری ژێنــێ لــە لایــەن ژێنێکــی تــرەوە (بنــەڕەت: لــە یۆنــــانی‌یــــەوە "stoppage"؛ epistatic /ˌɛpɪˈstatɪk/ *adj*) ۞ اپیستاز

**epistaxis** /ˌɛpɪˈstaksɪs/ *noun*
(پزشکی، بەربوونی) خوێنی لووت، nosebleed ۞ خون دماغ، رُعاف

**episteme** *noun*
مەعریفەت، مەعریفە، ناسین ۞ معرفت، شناخت

**epistemic** /ˌepɪˈstiːmɪk, US -ˈstem-/ *adjective*
مەعریفــەیی، مەعریفــەتی، ســەربە ناســین یــان مەعریفە، سەربە یان پێوەندی بە ناڵیجەوە هەیە، cognitive (epistemically *adv*) ۞ وابسته به معرفت

**epistemics** *noun, pl.*
لێکۆڵینەوەی زانستی مەعریفە ۞ بررسی علمی شناخت

**epistemology** /ɪˌpɪstəˈmɒlədʒi, US -ˈmɑːl-/ *noun*
مەعریفەناسی، ناسین‌ناسی: لقێ لە فەلسەفە کە لەمەڕ بنەڕەت، سروشت، شێوە و سنوورەکانی زانستی مرۆڤایەتی دەکۆڵێتەوە (لە *epistēmē* یۆنانی "knowledge"؛ epistemological *adj*، epistemologist *n*، epistemologically *adv*) ۞ معرفت‌شناسی، شناخت‌شناسی، نظریه‌ی شناخت

**epistemum** *noun, pl.* epistema
1 manubrium – 2 ژوورچۆڵــــــــەمــــــــە، ژوورئێــسکەکۆڵە، بەشــی پێشەوەی anterior portion تــەنێــشتە pleuron ی مێروویــێ ۞ روجناغ

**epistle** /ɪˈpɪsl/ *noun*
1 نووســراوە، نقیــسار، نامیلکــە، پــەیام، نامــە 2 (Epistle) نامیلکە، نامە (هەر یەک لەو نامانەی پەیمانی نوێ New Testament، کە لە لایەن حــەوارییەکانــەوە نووســراون) ۞ 1 رســاله، مکتوب، رقعه 2 (با E) رساله

**epistle side** *noun*
لای ڕاســتی کلێــسە، ڕووبــەڕووی altar (بڕوانــە gospel side) ۞ اپیستل ساید

**epistolary** /ɪˈpɪstələri, US -leri/ *adjective*
بە شێوەی نامە، نامەیی، شێوەنامە ۞ در قالب نامه

**epistoler** *noun,* also epistler
1 نامــەنووس، نامیلکــەنووس 2 نامیلکــەخوێن، نامیلکــەبێژ (Epistle ــەکان و لــە ڕێوڕەسمی شێوی خواوەندی‌دا) ۞ اپیستلر

**epistome** *noun*
ژووردەم (لــە هێنــدێ بێ‌بڕبڕەدا invertebrate) ۞ اپیــستوم

**epistrophe** /ɪˈpɪstrəfi, US ɛ-/ *noun*
دووپاتەبوونەوەی وشەیێ لە کۆتایی ڕستە یان بڕگــەیێ دوابــەدوای یــەک (بنــەڕەت: لــە *epistrophē* یۆنانی، لە *epistrephein* "بادانەوە") ۞ اپیستروف

**epistyle** /ˈɛpɪstʌɪl/ (epistylar *adj*) = architrave

**epitaph** /ˈepɪtɑ:f, US -tæf/ *noun*
بەردەنووسی گۆڕ، کێلی نووسراو ◌ کتیبەی روی گور

**epitasis** /ɪˈpɪtəsɪs/ *noun, pl.* epitases
دەقی چیرۆک یان داستان ◌ متن داستان

**epithalamium** /ˌɛpɪθəˈleɪmɪəm/ *noun, pl.* epithalamiums or epithalamia
گۆرانی یان هەڵبەستی زەماوەند، ستران یا هۆنراوە بۆ سەربەرزی بووک و زاوا (epithalamic /-ˈlamɪk/ *adj*) ◌ سرود یا آواز عروسی

**epithelioma** /ˌepəˈθɪlɪˈəʊmə/ *noun, pl.* epitheliomata
شێرپەنجەی روکەشەشانە(یی) ◌ سرطان ظهاری

**epithelium** /ˌepɪˈθi:lɪəm/ *noun, pl.* epithelia /-lɪə/
(تونیکاری) رووکەشەشانە (بڕوانە :epithelial /ˌepəˈθi:lɪəl/ *adj* ;endothelium رووکەشەشانەیی) ◌ بشرەی غشاء مخاطی

**epithet** /ˈepɪθet/ *noun*
1 ناو، سەرنێو، سەرناو، نازناو، ئاوەڵناو، سەرخستە، رەنگدێر، سیفەت 2 (بێباو) = taxonomic expression 3 ناوێکی بۆلی name بۆ ناساندنی یەکەیێکی خوارتر genus لە نێوەوەی توخمی subordinate unit (epithetic /ˌepɪˈθetɪk/ or epithetical :/ˌepɪˈθetɪkl/ *adj* وەسفی؛ epithetically *adv*) ◌ 1 عنوان، لقب، صفت 2 و 3 اپیتت

**epitome** /ɪˈpɪtəmi/ *noun*
1 نموونە، میناک، هێما، :embodiment *He is the epitome of a modern young man* ◊ *clothes that are the epitome of good taste* 2 کورتە، پوختە 3 (the epitome of) نموونەی تەواو، سەرنموونە (epitomist *n*: کورتەنووس) ◌ 1 مظهر، تجلی 2 خلاصه 3 مثال کامل

**epitomization** *noun*
کورتەنووسی ◌ خلاصەنویسی

**epitope** /ˈɛpɪtəʊp/ *noun,* also determinant or antigenic determinant
(زیندەکیمیا) ژوورجێ، سەرجێ، سەرشوێن: بەشێکی گەردی ئانتیژێن کە ئانتیبادییێ دەتوانێ پێوەی بنووسێ، ناوچەیێکی گەردی molecular region لەسەر (ئاستی) ئانتیژێنێ کە دەتوانێ ببێتە هۆی کاردانەوەی پاراستن و لەگەڵ ئانتیبادییێکی تایبەت لێک بدرێ و بەهۆی کاردانەوەیێکی وا بەرهەم بێ ◌ اپیتوپ

**epizoic** /ˌɛpɪˈzəʊɪk/ *adjective*
(زیندەناسی) ژیاو لەسەر لەشی گیانەوەر (epizoite /ɛpɪˈzəʊʌɪt/ *n*): مشەخۆری گیانەوەر) ◌ اپیزوئیک

**epizoon** /ˌepˈɪzəʊɒn/ *noun*
مشەخۆری دەرەوە ◌ انگل برونی

**epizootic** /ˌepɪzəʊˈɒtɪk/ *adjective, noun*
*adj* پەتا، درمی *n* ئازار (هی گیانەوەران) ◌ *adj* همەگیر *n* اپیزوتیک

**epoch** /ˈi:pɒk, US ˈepək/ *noun*
1 سەردەم، قۆناغ، رۆژگار، چەرخ 2 خاڵی وەرچەرخان یا گۆڕان، رووداوی مێژوویی هەرەگرنگ، مێژووی بنەرەتی هەر شتێ 3 (زەویناسی) لاسەردەم، قۆناغ (دوای period) 4 مێژووی یەکلایی روودانی شتێکی ئەستێرەوانی یا گۆڕانی تەنە ئاسمانییەکان ◌ 1 دوره، عصر، دوران 2 حادثەی تاریخی، نقطەی عطف 3 (زمین‌شناسی) دور 4 اپوک

**epochal** /ˈi:pɒkl/ *adjective*
1 سەربە سەردەم، سەرەدمی، چەرخی 2 یەکجار گرنگ، هەرەگرنگ، یەکجار کاریگەر ◌ 1 عصری 2 بسیار مهم، تأثیرگذار

**epoch-making** *adjective*
مێژووساز، مێژوویی، هەرەگرنگ، دیاریکەر، significant ◌ دوران‌ساز

**epode** /ˈɛpəʊd/ *noun*
1 جۆرێ هۆنراوەی لیریکی کە لەودا دێرە درێژەکان بە دوای دێرە کورتەکاندا دێ 2 بەشی سێهەمی چامەیێ ◌ 1 نوعی شعر غزلی 2 اپود

**eponym** /ˈepənɪm/ *noun*
ناولێهەڵگیراو (ناوی خێڵ، نەتەوە، شوێن، کتێب، فیلم و شانۆ لەوەوە هەڵگیراوەتەوە؛ eponymic *adj*) ◌ عنوان‌دهنده

**eponymous** /ɪˈpɒnɪməs, US ɪˈpɑ:n-/ *adjective*
ناولێهەڵگیراو ◌ عنوان‌دهنده

**eponymy** *noun*
دارشتنی ناوەکان لە eponym ـەکان ◌ اپونیمی

**epopee** *noun*
1 هۆنراوەی پاڵەوانی یان قارەمانی 2 = epic ◌ شعر حماسی

**epos** *noun*
1 هۆنراوەی پاڵەوانی یان قارەمانی 2 = epic 3 کۆمەڵە هۆنراوەیێ کە دەمبەدەم هاتووە (وەک بابەتێکی پاڵەوانی و فەرمییانە (یان بە شێوەیێکی formally) رێک نەخراوە) ◌ اپوس

**epoxide** /ɪˈpɒksʌɪd/ *noun*
(کیمیا) ئێپۆکساید، ئێپۆکسید (ئاوێتەیێکی ئەندامی) ◌ اپوکسید

**epoxy** /ɪˈpɒksi, US ɪˈpɑ:ksi/ *noun, pl.* epoxies, also epoxy resin
ئێپۆکسی (= جۆرێ کەتیرە یان چەسپ، کۆمەڵی ئێپۆکسایدەکانی تیایە) ◌ اپوکسی

**epsilon** /ˈɛpsɪlɒn, US ɛpˈsʌɪlɒn/ *noun*
پێنجەمین پیتی ئەلفوبێی یونانی (E, ε) ◌

ابسیلون

**Epsom salts** /ˌepsəm ˈsɔːlts/ *noun, pl.*
خوێی ئینگلیسی $MgSO_4 \cdot 7H_2O$ سولفاتی مەنیزیوم (وەکوو دەرمان یان دەرمانی رەوانی) ۞ سولفات منیزیوم

**Epstein-Barr virus** *noun, abbreviation* EBV
(پزشکی) herpesvirusی کە دەبێتە هۆی تای رژێنەیی و پێوەندی بە هێندێ شێرپەنجەوە هەیە (لە ناوی ڤایرۆس‌ناسانی بریتانیایی و ئیرلەندی Michael A. *Epstein* و (Y. M. *Barr* ۞ ای‌بی‌وی

**epyllion** /ɪˈpɪliən, US ɛ-/ *noun, pl.* epyllia
هۆنراوەی گێرانەوەیی شێوە epic، بەلام کورت‌تر ۞ اپیلیون

**equability** /ˌekwəˈbɪləti/ *noun*
1 مامناوەندی، فێنکی، سازگاری، خۆشی (ئاو و هەوا) 2 لەسەرەخۆیی، هێمنی، ئارامی ۞ 1 اعتدال 2 خونسردی

**equable** /ˈekwəbl/ *adjective*
1 مامناوەند، فێنک، ئەندازە، سازگار، خۆش 2 لەسەرەخۆ، ئارام (*adv* equably /ˈekwəbli/: بە هێمنی) ۞ 1 معتدل 2 خونسرد

**equal** /ˈiːkwəl/ *adjective, noun*
*adj* بەقەدیەک، بەرامبەر، یەکسان، چوون، هاوجووت، هاوئاست، هاوئەندازە، یەک‌ئەندازە، سەک‌سەنگ، هاوسەنگ، هاوشان، هاوپلە *n* 1 هاوتا 2 ژمارەی بەرامبەر، بڕی بەرامبەر ۞ *adj* مساوی، برابر، هم‌تراز، هم‌پایە *n* 1 قرین 2 عدد یا مقدار متساوی

**equalitarian** /ɪˌkwɒlɪˈteːriən, US iː-/ = equalitarian

**equality** /iˈkwɒləti, US iˈkwɑː-/ *noun*
بەرامبەری، بەقەدیەکی، یەکسانی، هاوپلەیی، لێکچوویی، وەکیەک‌بوون ۞ تساوی، هم‌چندی، همانندی

**equality of rights** *noun, pl.*
بەرامبەری ماف(ەکان)، یەکسانی ماف ۞ برابری حقوق

**equalization** /ˌiːkwəlaɪˈzeɪʃn, US -ləˈz-/ *noun,* also equalisation
1 بەرامبەرکردن، یەکسان‌کردن، بەقەدیەک‌کردن، هاوسەنگاندن، ریک‌کردن، وەکیەک‌کردن، بەرامبەربوون، بەرامبەری، یەکسانی 2 راست‌کردنەوە ۞ 1 مساوی کردن، مساوات 2 تعدیل

**equalizer** /ˈiːkwəlaɪzər/ *noun,* also equaliser
بەرامبەر (گۆل لە تۆپێن‌دا): *Rooney scored the equalizer* ۞ تساوی

**equally** /ˈiːkwəli/ *adverb*
بە شێوەیەکی یەکسان، بەرامبەرانە: *Diet and exercise are equally important* ◊ *They share the housework -lly* ۞ بە طور مساوی

**equals sign** *noun,* also equal sign
نیشانەی بەرامبەری (=) ۞ علامت مساوی

**equanimity** /ˌekwəˈnɪməti/ *noun*
1 هاوسەنگی 2 لەسەرەخۆیی، ئارامی، مەندی، سنگ‌فراوانی، پشوودرێژی: *She accepted the prospect of her operation with -ty* (-ous /ɪˈkwænɪməs, US iː-/ *adj*) ۞ 1 تعادل 2 خونسردی، بردباری

**equation** /ɪˈkweɪʒn/ *noun*
1 (بیرکاری) هاوکێشە 2 هاوسەنگی، هاوکێشی، بەرامبەربوون 3 کاری وەک‌یەک‌دانان، کاری بە بەرامبەر زانین، بەرامبەرکردن ۞ 1 معادلە 2 تعادل، موازنە، تساوی 3 اکواسیون

**equational** *adjective*
هاوکێشەیی (*adv* equationally) ۞ معادلەای

**equator** /ɪˈkweɪtə(r)/ *noun*
1 پشتێنەی زەوی، نیوان، یەکسانەهێل، پشتێنان: *The island is twenty degrees south of the -tor* 2 کورتەی celestial equator ۞ خط استوا

**equatorial** /ˌekwəˈtɔːriəl/ *adjective*
پشتێنەیی، نیوانی، سەربە یەکسانەهێل، یەکسانەهێلی، گەرمێنی: *equatorial rainforests* ◊ *an equatorial climate* ◊ *a satellite in equatorial orbit* (*adv* equatorially) ۞ استوایی، گرمسیری

**equatorial climate** *noun*
مەلبەند یا ناو و هەوای پشتێنەیی ۞ اقلیم استوایی

**equatorial currents** *noun, pl.*
تەوژمە پشتێنەیی‌یەکان ۞ جریان‌های استوایی

**Equatorial Guinean** /ˈgɪniən/ *noun, adjective*
*n* خەلکی گینەی پشتێنان، ولاتێ لە رۆژاوای ئەفریکا *adj* سەربە گینەی پشتێنان یان خەلکەکەی ۞ *n* اهل گینەی استوایی *adj* وابستە بە مردم یا گینەی استوایی

**equatorial storms** *noun, pl.*
رەشەباکانی پشتێنەیی، رەشەبا پشتێنەیی‌یەکان ۞ طوفان‌های استوایی

**equatorial zone** *noun*
ناوچەی پشتێنەیی ۞ منطقەی استوایی

**equerry** /ɪˈkweri, US ˈekwəri/ *noun, pl.* equerries
1 مەیتەر 2 یاریدەدەری ئەندامانی خێزانی پاتشایی ۞ 1 مهتر 2 آجودان

**eques** /ˈɛkweɪz/ = singular form of equites

**equestrian** /ɪˈkwestriən/ *adjective, noun*
*adj* سوارکارانە، سەربە سوارکاری، سەربە، ئەسپ‌سواری، سوارە *n* سوارکار ۞ *adj* وابستە

به اسب‌سواری *n* اسب‌سوار
**equestrienne** /ɪˌkwɛstrɪˈɛn/ *noun*
ژنی ئەسپ‌سوار، ئەسپ‌سواری ژن ◌ زن اسب‌سوار
**equestrianism** *noun*
شارەزایی یا وەرزشی سوارکاری، ئەسپ‌سواری، دەس‌وجڵەو ◌ مهارت یا ورزش اسب‌سواری
**equi-** /ˈiːkwɪ-, US ˈek-/ *prefix*
پێشگر: هاو، هەڤ، بەرامبەر، ڕێک، یەکسان؛ بە شێوەیەکی یەکسان، بەرامبەرانە: *equidistant*، *equipoise* (بنەڕەت: لە -*aequi* لاتین، لە *aequus* «equal») ◌ پیشوند: هم، برابر؛ به طور مساوی
**equiangular** /ˌiːkwəˈæŋgjələ(r)/ *adjective*
گۆشەڕێک، هاوگۆشە، هەڤکونجی ◌ متساوی‌الزوایا
**equicaloric** *adjective*
هاوکالۆری، هاوگەرمۆکەیی: *equicaloric diets* ◌ اکوی‌کالوریک
**equid** /ˈɛkwɪd/ *noun*
شیردەر یان گوانداریّ لە تیرەی ئەسپ (Equidae) ◌ پستان‌داری از خانواده‌ی اسب
**equidistant** /ˌiːkwɪˈdɪstənt, US ˌek-/ *adjective*
هاومەودا، بە یەک ئەندازەدوور، بەقەدیەک‌دوور، لەنیوەی ڕێ: *All points on a circle are equidistant from the centre* (equidistance /ˌiːkwɪˈdɪstəns, US ˌek-/ *n* equidistantly *adv*) ◌ هم‌فاصله
**equifinal** /ˌɛkwɪˈfʌɪn(ə)l/ *adjective*
هاومەبەست، هاوئامانج، هاوئەنجام (equifinality *n*: هاومەبەستی، هاوئامانجی، هاوئەنجامی؛ equifinally *adv*) ◌ هم‌غایت، هم‌نتیجه
**equilateral** /ˌiːkwɪˌlætərəl/ *adjective*
لاڕێک، لابەرامبەر، هاولا ◌ متساوی‌الاضلاع
**equilibrist** = acrobat
**equilibristic** = acrobatic
**equilibrium** /ˌiːkwɪˈlɪbriəm, US ˌek-/ *noun, pl.* equilibria /-rɪə/
1 هاوکێشی، هاوسەنگی، تەرازمەندی، لەنگەر، لەنگەرگیری 2 لەسەرەخۆیی، ئارامی (بنەڕەت: لە *aequilibrium* لاتین، لە -*aequi* «بەرامبەر» + *libra* «هاوسەنگی، لەنگەر») ◌ 1 تعادل، موازنه 2 آرامش
**equilibrium constant** *noun*
جێگیری هاوسەنگی ◌ ثابت تعادل
**equilibrium diagram** *noun*
هێڵکاری هاوسەنگی ◌ نمودار تعادل
**equilibrium point** *noun*
خاڵی هاوسەنگی ◌ نقطه‌ی تعادل
**equilibrium position** *noun*
ڕەوشی هاوسەنگی ◌ وضع تعادل
**equilibrium pressure** *noun*
پاڵەپەستۆی هاوسەنگی، گوشاری هاوسەنگی ◌ فشار تعادل
**equilibrium state** *noun*
بار یان دۆخی هاوسەنگی ◌ حالت تعادل
**equilibrium system** *noun*
سیستم یا ڕێکخستەی هاوسەنگی ◌ سیستم تعادلی
**equilibrium theory** *noun*
تیۆری هاوسەنگی ◌ نظریه‌ی تعادل
**equine** /ˈekwaɪn, US ˈiːk-, US ˈiːk-/ *adjective, noun*
*adj* ئەسپ‌ئاسا، شێوەئەسپ، ئەسپی، سەربە ئەسپ *n* ئەسپ یان گیانەوەریّ لەو تیرەیە ◌ *adj* اسب‌مانند، وابسته به اسب *n* اسب
**equinoctial** /ˌiːkwɪˈnɒkʃl, ˌek-, US -ˈnɑːk-/ *adjective, noun*
*adj* ڕۆژگەڕانەوەیی، سەربە ڕێکەمەنی، هێڵی ڕۆژگەڕانەوەیی *n* (هەروەها equinoctial line = celestial equator) ◌ اعتدالی، خط اعتدالی
**equinoctial point** *noun*
خاڵی ڕۆژگەڕانەوەیی یان بەرامبەران ◌ نقطه‌ی اعتدالی
**equinoctial year** = solar year
**equinox** /ˈiːkwɪnɒks, ˈek-, US -nɑːks/ *noun*
ڕۆژگەڕانەوە، بەرامبەران، شەوڕێکان، ڕێکەمەنی (بەرامبەربوونی شەو و ڕۆژ، دەوروبەری 21ی مارس و 22ی سێپتامبر) ◌ اعتدال
**equipage** /ˈɛkwɪpɪdʒ/ *noun*
1 (کۆن) = equipment 2 (مێژوویی) کالیسکە، ئەسپەکان و دەس‌وپێوەند ◌ 1 = equipment 2 کالسکه، اسب‌ها و ملتزمین
**equipment** /ɪˈkwɪpmənt/ *noun*
1 کەل‌وپەل، سازوتفاق، شت‌ومەک، سامان، ئەسپاپ، ڕەخت، تێشواک، کەرەسە، دەزگا: *office equipment* 2 تەیارکردن، سازکردن، ئامادەکردن، ڕەخت‌کردن: *The equipment of the photographic studio was expensive* ◌ 1 لوازم، تجهیزات، دستگاه 2 تجهیز
**equipoise** /ˈiːkwɪpɔɪz, US ˈek-/ *noun*
هاوسەنگی، هاوکێشی، لەنگەر، پارسەنگ، لەنگەرە ◌ تعادل، موازنه، وزنه‌ی تعادل
**equipollent** /ˌiːkwɪˈpɒl(ə)nt, US ˌɛkwɪ-/ *adjective, noun*
*adj* هاوهێز، هێزڕێک، بەرامبەرهێز، یەک‌هێز *n* شتێکی هاوهێز (equipollence /ˌiːkwɪˈpɒl(ə)ns, US ˌɛkwɪ-/ or equipollency *n*) ◌ *adj* متعادل در قوت *n* چیز متعادل در قوت

**equiponderant** /æi:kwə'pɑ:ndərənt/ *adjective*
هـــاوکێش، هاوســـەنگ ( equiponderance
:/æi:kwə'pɑ:ndərəns/ *n* هاوکێـــــشی،
هاوسەنگی) ◌ هم‌وزن

**equipotent** /ˌi:kwɪ'pəʊt(ə)nt, US ˌɛkwɪ-/ *adjective*
هاوکاریگـــەر، بەرامبـــەر لـــە کـــارتێکردندا ◌
اکویپوتنت

**equipped** *adjective*
ساز، ئامادە، تەیار، بەرهەڤ ◌ مجهز، آمادە

**equisetum** /ˌɛkwɪ'si:təm/ *noun*, equiseta /-tə/ or equisetums
جـــۆرێ گیـــا لـــە تـــیرەی horsetail ـــەکان
دەگرێتـــەوە [تـــوخم *Equisetum*] (بنـــەڕەت: لـــە
لاتینـــــەوە *equus* "horse" + *saeta* "bristle")
◌ اکویـــستوم

**equitable** /'ekwɪtəbl/ *adjective*
دادپەروەرانـــە، دادپـــەروەر، بـــەداد، خـــودابین،
بەرامبـــەربین، حـــەق، دروســـت، بەرحـــەق، ژیرانـــە
:equitableness *n* ؛equitability *n*)
دادپـــەروەری، بەئینـــسافی، بـــەدادی، دادگـــەری؛
:equitably /-bli/ *adv* دادپەروەرانـــە،
خودابینانە) ◌ منصفانه، عادل، معقول

**equitant** /'ekwɪt(ə)nt/ *adjective*
1 لێـک‌ئـالاو (ڕووەک، لـەمـەڕ گـەڵاێکـەوە) 2
سوار لەسەر ئەسپ ◌ 1 بهم‌پیچیده 2 سوار بر
اسب

**equitation** /ˌekwɪ'teɪʃn/ *noun*
(هونـــەری) ســـوارکاری، ئەســـپ‌ســـواری ◌
اسب‌سواری

**equites** /'ɛkwɪteɪz/ *noun, pl. sing.* eques
(لـە ڕۆمـی کـۆندا) چـینی سـپای سـوارەی
خاوەن‌ماف ◌ اکویتس

**equity** /'ekwəti/ *adjective, pl.* equities
1 دادگـــەری، دادپـــەروەری، داد، ئینـــساف،
خـودابینی، بێ‌لایەنی، بێ‌غـەرەزی، لانەگرتن 2
دارایی پوختە 3 (equities) ستاک یان بەش یان
پـــشکە ئاســـاییـــەکان 4 (Equity) یـــەکێتی
ئەکتەران (بنەڕەت: لە *equité* فەرەنـسی کۆن، لە
*aequitas* لاتـین، لـە *aequus* "بـەرامبـەر") ◌ 1
انصاف، عدل، عدالت، بی‌غرضی 2 دارایی خالص 3
(در جمع) سهام عادی 4 اتحادیەی بازیگران

**equivalence** /ɪ'kwɪvələns/ *noun*
1 بەرامبـــەری، هاوســـەنگی، هاوئەنـــدازەیی،
هاونرخی 2 بەرامبەر 3 هاوهێزی، ئێکویڤالێنس
◌ 1 تعادل، هم‌ارزی معادل 2 هم‌ظرفیتی

**equivalent** /ɪ'kwɪvələnt/ *adjective, noun*
*adj* 1 بەرامبـــەر، هاوســـەنگ، هاوئەنـــدازە،
هاوچەند، هـاونرخ، هاوواتا، هاوتا، هاوشێوە 2
(کیمیـا) هـاوهێز، ئێکـویڤـالێنت *n* بەرامبـەر
:equivalently /ɪ'kwɪvələntli/ *adv*)
بەرامبەرانە) ◌ *adj* 1 معادل، هـم‌ارز، هـم‌معنی،
نظیر، مشابە 2 هم‌ظرفیت *n* معادل

**equivocal** /ɪ'kwɪvəkl/ *adjective*
1 واتاڵـێل، تەژمـە، دووواتـادار، بـەپێچ‌وپـەنا،
ناڕوون، نادیـار، گێژکـەر، بەهەڵـەدابەر، ناڕۆشن:
2 *an equivocal statement* 2 جێـی‌پرسـیار،
گومـــان‌لەســـەر، گومانـــاوی، جێـــی‌شـــک
(هەڵـــــس‌وکـــــەوت، equivocality
:/ɪˌkwɪvə'kæləti/ *n* جێـــی‌پرســـیاربوون،
گومان‌لەسەری، جێی‌شک‌بوون؛ equivocalness
:equivocally /ɪ'kwɪvəkli/ *adv* ؛*n*
بەپێچ‌وپەنایانە، بە پێچ‌وپەناوە؛ لە *aequivocus*
late Latin لـە *aequus* لاتـین "equally" +
*vocare* "بانـگ‌کـردن "to call") ◌ 1 دوپهلـو،
گنگ، نامشخص 2 مشکوک

**equivocation** /ɪˌkwɪvə'keɪʃn/ *noun*
1 قـــسەپێچ‌دان، لـــێڵ‌بێـــژی، زمـــان‌بـــازی،
دووواتـــاداری، بەهەڵـــەدابردن، بـــەپێچ‌وپـــەنا
قـسەکردن، ئـاین‌وئـۆیین 2 قـسە یـان زاراوەی
بـــەپێچ‌وپـــەنا (equivocator *n*: زمـــان‌بـــاز،
قسەپێچ‌دەر، لێڵ‌بێژ؛ equivocatory *adj*) ◌ 1
دوپهلوگویی 2 حرف یا اصطلاح دوپهلو

**equivoque** /'i:kwɪvəʊk, US 'ɛkwɪ-/ *noun*, also equivoke = ambiguity

**er** /ɜ:(r)/ *interjection*
ئـهم: *'Will you do it?' 'Er, yes, I suppose so.'* ◌ اوم

**ER** *abbreviation* Elizabetha Regina
شاژن ئێلیزابێت (ب.ت. لە قوتوی پۆستیدا) ◌
ملکەی الیزابت

**ER** /ˌi: 'ɑ:(r)/ *abbreviation* emergency room

**Er** symb. the chemical element erbium

**-er**[1] *suffix*
پاشگر: 1 (کەس، گیانەوەر یـان شـتێ کـە کـار و
چالاکیی‌ێ دەکا) کەر، وان، ڤان، گەر، کار، ساز،
چی: *farmer* 2 ئاماژە بـە کـەس یـان شـتێ کـە
ڕەوشت یا شێوەیێ تایبەتی هەیە: *two-wheeler*
3 ئاماژە بـە کـەسێ کـە پێوەنـدی بـە شـت یـان
بابەتێکی تایبەتی‌یەوە هەیە: *milliner* 4 خەڵکی
شوێنی، نشین، ی، ئاماژە بە کەسێ کە سەربە جێگا
یـان کۆمـەڵێکە: *city-dweller* (-*ere* ئینگلیـسی
کۆن، ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ پسوند: 1 گـر، کننـدە،
چی 2 اشارە بە شخص یا چیزی کـە دارای ویژگـی
یا شکل خاصی هـست 3 اشارە بـە شخـصی کـە بـا
چیز یا موضوعی ارتباط دارد 4 اهل جایی، ی

**-er**[2] *suffix*
پاشگر: 1 کەر، وان، ڤان، گەر، کـار، سـاز، چـی:
*city-* 2 خەڵـکی شـوێنی، نـشین، ی: *farmer*
*dweller* 3 دووبـارە، لەسـەریەک، پـەیتاپـەیتا،
لەپەسـا 4 نیـشانەی ئـاوەڵناوی بـەراورد: *faster*

◇ پسوند: 1 گر، کننده، چی 2 اهل جایی، ی 3 مکرراً، پی‌درپی 4 علامت صفت تفضیلی

**-er**[3] *suffix*

پاشگر: نیشانەی ئاوەڵناوی بەراورد: (لە ئاوەڵکار *faster* و لە ئاوەڵناو *bigger*) ◇ پسوند: علامت صفت تفضیلی

**-er**[4] *suffix*

پاشگر: (ناو ساز دەکا، لە زانکۆی ئاکسفۆرد) پاشگریکی نافەرمی و رەمەکی‌یە: *footer* ◇ پسوند: پسوند غیررسمی و عامیانە

**-er**[5] *suffix*

پاشگر: دووبارە، لەسەریەک، پەیتاپەیتا، لەپەسا: *patter*، *chatter* (-*erian*، -*rian* ئینگلیسی کۆن، ئەڵمانی‌بنەڕەت) ◇ پسوند: مکرراً، پی‌درپی

**-er**[6] *suffix*

پاشگر: (ناو ساز دەکا) 1 وەک *sampler* (بڕوانە -ar[1] [پاشبەندیکە بەرامبەر بە -*aris* لاتین])؛ وەک *butler*، *danger* [پاشبەندیکە بەرامبەر بە -*arius*، -*arium* لاتین]؛ وەک *border* [پاشبەندیکە (بە ریگای -*eure* فەرەنسی کۆن) بەرامبەر بە -*atura* لاتین]؛ وەک *laver*. بڕوانە laver[2] [پاشبەندیکە (بنەڕەت: بە ریگای -*eor* فەرەنسی کۆن) بەرامبەر بە -*atorium* لاتین] 2 بەرامبەر بە -or[1] (بنەڕەت: بە ریگای فەرەنسی کۆن یان فەرەنسەی ئەنگلونۆرمانەوە -Anglo Norman) ◇ پسوند: اسم‌ساز

**era** /ˈɪərə, US ˈɪrə, ˈerə/ *noun*

1 (زەوی‌ناسی) سەردەمان (دوای aeon و پێش period) 2 سەردەم، قۆناخ، سوور، چاخ، چەرخ، رۆژگار 3 سەرەتای قۆناخ 4 سەردەم ◇ 1 (زمین‌شناسی) دوران 2 عصر، دوره، دوران 3 آغاز دوره 4 دوران

**eradiation** /ɪˌreɪdɪˈeɪʃn/ *noun*

تیشکدان ◇ تابش

**eradicable** /ɪˈrædəkəbl/ *adjective*

ریشەکێش دەکرێ، خاشەبڕ دەکرێ، لە رەگەوە دەردەکێشرێ ◇ ریشەکن‌شدنی

**eradication** /ɪˌrædɪˈkeɪʃn/ *noun*

ریشەدەرهێنان، هەڵتەکاندن، نەهێشتن، خاشەبڕکردن، بنکۆڵ‌کردن، لەنێوبردن، تیابردن، لەبن‌دەرهێنان، هەڵکێشان، ریشەکێش‌کردن، بنبڕکردن، بنەبڕکردن، کوێراندنەوە، کوێرکردنەوە (eradicant *n*) ◇ قلع‌وقمع، نابودی، ریشەکنی

**eradicative** /ɪˈrædɪkeɪtɪv/ *adjective*

ریشەکێش، خاشەبڕ، هەڵتەکێنەر ◇ نابودکنندە

**eradicator** *noun*

1 ریشەکێش، خاشەبڕ، هەڵتەکێنەر 2 جەوهەرسڕ، خاوێن‌کەرەوە، سڕێنەر، سڕێنە (ب.ت. مەتریالێکی کیمیایی کە جەوهەر دەسڕێتەوە) ◇ 1 نابودکنندە 2 ارادیکاتور

**erasable** /ɪˈreɪsəbl/ *adjective*

سڕەنی، لە سڕین دێ، دەسڕێتەوە، پادەبێتەوە (erasability *n*) ◇ پاک‌کردنی

**eraser** /ɪˈreɪzə(r), US ɪˈreɪsər/ *noun*

سڕە (چ تەختەڕەشە یان پێنووس) ◇ پاک‌کن

**erasion** /ɪˈreɪʒən/ *noun*

تیابردن، نەهێشتن، لابردن، کوێرکردنەوە، پا(ک)کردنەوە، کوژاندنەوە، سڕینەوە، تاشین ◇ محو، تراش

**Erastian** *adjective, noun*

1 سەربە ئەو ریبازە 2 لایەنگری ئیراستیەنیزم ◇ اراستین

**Erastianism** /ɪˈrastɪəˌnɪz(ə)m/ *noun*

ریبازێ کە پێی وایە حکومەت دەبێ دەسەڵاتی بەسەر کلیسە و کاروباری دینی‌دا هەبێ (بە هەڵە دراوەتە پاڵ دینەوانی سویسی سەدەی شازدە Thomas Lieber Erastus) ◇ اراستینیسم

**erasure** / ɪˈreɪʒə(r)/ *noun*

1 سڕین، سڕینەوە، پێوەنەهێشتن، شۆردنەوە، لابردن، کوژاندنەوە، پاک‌کردنەوە 2 وشە (و هتد)ی پاکەوەبوو، جێگای سڕانەوە، پاکایی، سڕایی، جێگا یان شوێنی پاکەوەبوو ◇ 1 عمل پاک کردن 2 اراسور

**Erato** *noun*, Greek *Eratō*

ئیراتۆ: Muse ی یۆنانی هۆنراوەی خۆشەویستی و ئاوازین ◇ اراتو

**erbium** /ˈɜːbiəm, US ˈɜːrb-/ *noun*

(کیمیا) ئیربیۆم (بە ژ.گ. 68، ن. Er) ◇ اربیم

**ere** /eə(r), US er/ *conjunction, preposition*

بەر لە، پێش لە، لەمەوبەر: *Ere long* (= soon) they returned ◇ قبل از

**Erebus** *noun*, Latin, from Greek *Erebos*

ئیریبوس: 1 کەسایەتی‌پێدان بە تاریکی لە میتۆلۆژی یۆنانی‌دا 2 شوێنی تاریکی یان جیهانی تاریکی ◇ اربوس

**erect** /ɪˈrekt/ *adjective*

1 راوێستاو، وێستاوی، راست، قیت، قنج، بەل، رەق، زیت، رەپ، بژەوەبوو، ئەستوونی 2 هەستاو، ئیرەق، قیتەوەبوو، هەڵداو، رەپبوو، بزواو (erectly /ɪˈrektli/ *adv*: راست، ریک‌وراست، راستەوخۆیانە؛ erectness /ɪˈrektnəs/ *n*: راوێستاوی، وێستاوی، قیتی، رەپی، بژەوەبوویی، قیتەوەبوویی) ◇ 1 ایستادە، عمود، سیخ 2 در حال نعوظ

**erectile** /ɪˈrektaɪl, US ɪˈrektl/ *adjective*

لەرەپ‌هاتوو، رەپ دەبێ، رەپەنی، هەڵەستێ، قیتەوە دەبێ (erectility /ɪˌrekˈtɪlətɪ/ *n*: لەرەپ‌هاتوویی، رەپەنێتی) ◇ قابل نعوظ

**erection** /ɪˈrekʃn/ *noun*

1 دامەزراندن، دانان، بنیات‌نان، دروست‌کردن، چەقاندن، داکوتاندن، دابەستن، 2 construction خانووبەرە، بینا، دەزگا 3 رەپ‌بوون، هەستان،

رەقبوون، راستەوەبوون ◇ 1 تأسیس، احداث، نصب 2 ساختمان 3 نعوظ

**erector** *noun*, also erecter

1 (ماسوولکە) ڕەپێنەر، ڕەقێنەر، هەستێنەر، ڕەپکەر 2 بنیاتنەر، دامەزرێنەر، دانەر ◇ 1 (عضلەی) شق‌کننده، نعوظی 2 برپاکننده

**E-region** = E-layer

**erelong** /e'lɔːŋ/ *adverb*

(کۆن) بە زوویی، زوو، بەم زووانە، زۆر ناکێشێ یا ناخایەنێ، long، soon ◇ به زودی

**erenow** /e'naʊ/ *adverb*

(کۆن) بەر لە ئێستا، زووتر، پێش‌تر، لەوەپێش، heretofore ◇ پیش از این

**erewhile** /e'waɪːl/ *adverb*

(کۆن) برێ لەوە پێش، ماوەیێ لەوە پێش، کەمێ زووتر، a while before ◇ چندی پیش

**eremite** /'ɛrɪmʌɪt/ *noun*

گۆشەگیر، تەرکەدنیا، گۆشەگیری کریستانیەت، (eremitism *n*) hermit ◇ زاهد

**eremitic** *adjective*, also eremitical

گۆشەگیرانە ◇ زاهدانه

**erethism** /'ɛrɪθɪz(ə)m/ *noun*

ورووژان، خرۆشان، هەژان (ئاناسایی) ◇ تهیج

**erg(o)-** *prefix*

پێشگر: کار، پیشە، ئیش (بنەڕەت: لە *ergon* یۆنانی "work") ◇ پیشوند: کار، شغل

**erg**[1] /ɔːg/ *noun*

ئێرگ، کارە (= یەکەی وزە یان کار (لە سیستمی میتریک‌دا، بنەڕەت: لە *ergon* یۆنانی "کار") ◇ ارگ

**erg**[2] /əːg/ *noun*, *pl.* ergs or areg /'ɑːrɛg/

دەشتەلم (لە سەحارا؛ بنەڕەت: لە *'irk*، *'erg* عەرەبی‌یەوە) ◇ ارگ

**ergastic** *adjective*

ناکارا، ناچالاک، نازیندە ◇ غیرفعال

**ergastoplasm** *noun*

تۆڕی ئێندۆپلازمی یا نیوەپلازمی ◇ ارگاستوپلاسم

**ergastoplasmic** *adjective*

سەربە تۆڕی ئێندۆپلازمی یان نیوەپلازمی ◇ وابسته به ارگاستوپلاسم

**ergastulum** *noun*

زیندان یان بەندیخانەی کۆیلەکان، کۆیلەخانە (لە ڕۆمی کۆندا) ◇ زندان بردگان

**ergative** /'ɜːgətɪv, US 'ɜːrg-/ *adjective*, *noun*

*adj* (زمانەوانی) ئێرگەیتیف، ئێرگاتیف، خاوەن کاری تێپەڕ و ناتێپەڕ (ئەو توانایی‌یە دەدا بە کار (verb) کە لە هەر دووبار یانی هەم تێپەر و هەم تێنەپەر هەمان واتایان هەبێ، وەکوو: *I boiled the kettle*، *the kettle boiled* کتری‌یەکەم کولاند، کتری‌یەکە کولا (لێرەدا کتری لە هەر دوو ڕستەدا ئەرکێکی بابەتی هەیە یان ناوەڕۆکی هەیە، هەرچەند لە ڕوالەتدا یەکیان کارا و ئەوی‌یان بەرکارە)؛ زاراوەیێکە لە بنەڕەتدا ئاماژە بەو زمانانە (وەک باسک و گورجی) کە لەواندا تەواوکەری complement کاریکی تێپەڕ و کارای کاری تێنەپەڕ خاوەنی دۆخێکی case یەک‌جۆرن *n* وشە یان دۆخی ئێرگاتیف (بڕوانە inchoative؛ بنەڕەت: لە *ergatēs* یۆنانی‌یەوە "worker" (لە *ergon* "کار" + -ive) ◇ *adj* ارگتیو *n* واژه یا حالت ارگاتیو

**ergatively** /'ɜːgətɪvli, US 'ɜːrg-/ *adverb*

لەباری ئێرگاتیفەوە، بە شێوەیەکی ئێرگێتیف، ئێرگاتیفانە ◇ از نظر ارگتیو

**ergativity** *noun*

ئێرگێتیفیتی، ئێرگاتیفیتی ◇ ارگتیویتی

**-ergic** *suffix*

پاشگر: چالاکێنراوە (بە هۆی)، هەستیارە (سەبارەت) بە: *dopaminergic* (بنەڕەت: لە - *ergon* لە یۆنانی‌یەوە، لە Late Latin *ergia* "کار "work") ◇ پسوند: فعال‌شده توسط، حساس به

**ergo** /'ɜːgəʊ, US 'ɜːrgoʊ/ *adverb*, *conjunction*

لەبەرئەوە، کەواتە، کەوا بێت، جا کەوایە، هەرکەوایە، therefore، hence ◇ بنابراین، لذا

**ergoclaciferol** /ˌəːgə(ʊ)kal'sɪfərɒl/ = claciferol

**ergodic** /əː'gɒdɪk/ *adjective*

(بیرکاری) ئێرگۆدیک ◇ ارگودیک

**ergodicity** *noun*

(بیرکاری) ئێرگۆدیسیتی ◇ ارگودیسیتی

**ergograph** *noun*

دەزگای پێوانی توانایی کاری ماسوولکەیێ، ئێرگۆگراف ◇ ارگوگراف

**ergographic** *adjective*

سەربە ئێرگۆگراف ◇ وابسته به ارگوگراف

**ergometer** /əː'gɒmɪtə/ *noun*

ئێرگۆمیتر، ئێرگۆپێو، کارپێو ◇ ارگومتر

**ergonomic** /ˌɜːgə'nɒmɪk, US ˌɜːrgə'nɑːm-/ *adjective*

سەربە کارەوانی، سەربە لێکۆڵینەوەی کاری، کارلێکۆڵینەوەیی: *ergonomic design* ◇ وابسته به کارپژوهی

**ergonomically** /ˌɜːgə'nɒmɪkli, US ˌɜːrgə'nɑːm-/ *adverb*

لەباری لێکۆڵینەوەی کاری‌یەوە، لەبواری کارەوانی‌یەوە: *The layout is hard to fault ergonomically* ◇ از نظر کارپژوهی

**ergonomics** /ˌɜːgə'nɒmɪks, US ˌɜːrgə'nɑːm-/ *noun*, *pl.*

کارەوانی، لێکۆڵینەوەی کاری، کارلێکۆڵینەوە ◇ کارپژوهی

**ergonomist** *noun*
کـارەوان، کـارلێکۆڵ(ەر)، لێکۆڵـەری کـار ◌ کارپژوه

**ergonovine** *noun*
تفـتناسـایێ $C_{19}H_{23}N_3O_2$ کـە لـە ئێرگـۆت دەگیرێ و بە تایبەت بە شێوەی maleate ـەکەی وەک oxytocic ێ بەکاردێترێ ◌ ارگونووین

**ergosphere** /ˈɜːɡəʊsfɪə/ *noun*
(ئەسـتێرەوانی) ناوچـەیەکی وادانـراوی postulated region دەوری چاڵەڕەشێ، کـە وزە دەتوانێ لەی دەرباز بێ ◌ ارگوسفر

**ergosterol** /ɜːˈɡɒstərɒl/ *noun*
ئێرگۆستێرۆل $C_{28}H_{43}OH$، ئاوێتەیێکی نێو گەڵێ کـارگ کـە ئـەگـەر بدرێتـە بـەر ڕۆشـنایی سەرووبنەوشەوە، دەبێتە ڤیتامین $D_2$ ◌ ارگوسترول

**ergot** /ˈɜːɡɒt/ *noun*
ئێرگۆت، ژەنگ یان دۆکەی؟ چەودان (توخم *Claviceps*)، هـەرووەهـا کـارگ یـان کـەڕووی ژەنگهێنەر؛ نەخۆشی چەودان یان دەغڵی تر بـەو ژەنگـە (ergotic *adj*) ◌ ارگـوت، سـگاله (بنەڕەت: لە seigle فەرەنسی)

**ergotamine** /ɜːˈɡɒtəmiːn/ *noun*
(پزشـکی) تفـتناسـایێکی alkaloid ئێرگـۆتی $C_{33}H_{35}N_5O_5$ (لە ئێرگۆت دەگیرێ) کە دەبێتە هۆی تەنگبوونەوە یان وێکهاتنی ڕەگەکانی خوێن و بۆ چارەسەری لاسەرێشە migraine بەکاردێترێ ◌ ارگوتامین

**ergotism** /ˈɜːɡətɪz(ə)m/ *noun*
ئێرگۆتیزم، ژاراویبوون بە ژەنگ یان دۆکەی؟ چەودان ◌ ارگوتیسم

**erhu** /ɜːˈhuː/ *noun*, also erh hu
جـۆرێ ئـامێری دووژێـی چـینی، بـە دەنووکـە لێدەدرێ ◌ ارهو

**erica** /ˈɛrɪkə/ *noun*
ڕووەکـی تیرەیـێ کـە heath ـەکان دەگرێتـەوە [توخم *Erica*] ◌ اریکا

**ericaceous** /ˌɛrɪˈkeɪʃəs/ *adjective*
سەربە تیرەی گیاگ(ـهـ)ـسکەکان ◌ وابسـته بـه خانوادەی خلنگ‌ها

**ericoid** *adjective*
شێوەگیاکـگ، گیاگەسکی ◌ خلنگ‌مانند

**Erie** *noun*
1 ئەندامی گەلێکی سوورپێسـت کە لە باشووری گۆمی Erie لە سەدەی حەفدەدا دەژیان 2 زمانی تیاچووی Iroquoian ئەو گەلە ◌ اری

**erigeron** /ɪˈrɪdʒərɒn, US ɛ-/ *noun*
(ڕووەکناسی) جـۆرێ ڕووەکـی پرگژوگەڵا، لە تیرەی daisy [توخم *Erigeron*] ◌ اریگرون

**Erinys** /ɛˈrɪnɪs/ *noun*, *pl.* Erinyes /ɛˈrɪniːz/, Greek
ئێرینیس، فـۆری Fury (لە میتۆلۆژی یونانیدا) ◌ ارینیس

**eristic** /ɛˈrɪstɪk/ *adjective, noun*
*adj* سەربە مشتومڕ، پێوەندی بـە دەمەتەقێوە *n* هـەسـە 1 مشتومڕباز، فێرەمشـتومڕ 2 هونەری دەمەتەقێ یا مشـتومڕ ( eristically /ɛˈrɪstɪkli/ *adj*) ◌ *adj* جدلی *n* 1 اهل مجادله 2 هنر مجادله

**Eritrean** /ˌɛrɪˈtreɪən/ *noun, adjective*
*n* دانیشتووی ڕەسـەن یـان هـەریمی سـەربەخـۆی ئێریتریـا Eritrea لـە ڕۆژهـەلاتی بـاکووری ئەفریکا، ئێریتریـەیـی *adj* سـەربە ئێریتریـا یـان خەڵکەکەی، ئێریتریەیی، ئێریتریایی ◌ اریتره‌ای

**Erlenmeyer flask** /ˈɜːlənˌmʌɪə/ *noun*
شووشەی قووچی بنتەختی ملباریکی توێژینگە (بنەڕەت: لە ناوی کیمیازانی ئەڵمانی Emil *Erlenmeyer*) ◌ ارلنمیر فلاسک

**erl-king** /ˈɜːlkɪŋ/ *noun*
(لـە میـتۆلۆژی ئەڵـمانیدا) پادشـای جنۆکـان (جنۆکەی ڕیشنی خەڵەتێنەری منـاڵان بۆ وڵاتی مەرگ) ◌ ارل‌کینگ

**ERM** *abbreviation* Exchange-Rate Mechanism

**ermine** /ˈɜːmɪn, US ˈɜːrmɪn/ *noun, pl.* same or ermines
1 قاقوم، ئـاس، زاڵ، ژاڵ 2 stout = کـەوڵ یـان پێستی ئاس، فەروەی قاقوم 3 heraldry فەروەیێ بە خاڵ و پنکەی ڕەش لەسەر تەختێکی سپی 4 جـۆرێ پـەپوولـەی (شـەوگـەڕ) شـێوەئـاس، پـەپوولەئاسـێنـە [توخم *Spilosoma*: چـەنـدین جۆرن] ◌ 1 قاقم 2 پوست قاقم 3 و 4 ارمین

**ermined** *adjective*
داپۆشراو بە پێستەی ئاس، ئاسپۆش ◌ ارمیند

**ermines** /ˈɜːmɪnz/ *noun*
heraldry فەروەیێکی شێوەئاس یان قاقومی، بە خاڵ و پنکەی سپی لەسەر تەختێکی ڕەش ◌ ارمینز

**erminois** /ˌɜːmɪˈnɔɪz/ *noun*
heraldry فەروەیێکی شێوەئاس یا قاقومی، بە خاڵ و پنکەی ڕەش لەسەر تەختێکی زەرد ◌ ارمینویز

**erne** /ɜːn/ *noun*, also ern
(وێژەیـی) هەڵـۆیی دەریـایی یـان ئـاوی، sea eagle ◌ عقاب دریایی

**erogenous** /ɪˈrɒdʒɪnəs/ *adjective*, also -genic
1 ئاڵۆشاوی، ئاڵـۆشهێنـەر، بزوێنـەر، هەسـتیار، ئاستەم (بۆ بزوانی سێکسی) 2 بزواو، ناسـک ◌ 1 شهوت‌زا 2 تحریک‌شونده

**erogenous zones** /ɪˈrɒdʒənəs zəʊn, US ɪˈrɑːdʒ-, zoʊn/ *noun, pl.*
ناوچـە ئاڵـۆشهێنـەرەکان یـان بزوێنـەرەکان ◌ نواحی شهوت‌زا

**Eros** /ˈɪərɒs, US ˈɪrɑːs, ˈerɑːs/ *noun*, Greek *Erōs*

1 ئیرۆس (خـوای خۆشەویـستی، میـسۆلۆژی یۆنانی) 2 (لە تیۆری فرۆیدیدا) زگماکە یان ئینستینکتی ژیان 3 خۆشەویستی یان ئارەزووی سێکـسی ◌ 1 اروس 2 (در نظریــەی فرویــدی) غریزەی زندگی 3 محبت یا میل جنسی
**erosion** /ɪˈrəʊʒn, US ɪˈroʊʒn/ *noun*
1 داکراندن، داخوراندن، کراندن، رووتاندنەوە، ساورانەوە، داکران، کران، رووتانەوە، رامالین، داخوران، داشۆران (بە کاری با، باران و هتد): *soil erosion* 2 پووکانەوە، داچوون، تیاچوون 3 کەمبوونەوە، دابەزین، داکشان (بەرەبەرە) ◌ 1 فرسایش 2 تحلیل 3 کاهش
**erosional** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە erosion ـەوە هەیە (erosionally *adv*) ◌ وابسته به erosion
**erosive** *adjective*
داکرێنەرانە، داشۆرێنەرانە، داخورێنەر ◌ فرسایشی، فرساینده
**erotic** /ɪˈrɒtɪk, US ɪˈrɑːtɪk/ *adjective*
ئالۆشهێنەر، بزوێنەر، هەوەساوی، ئالۆشاوی، شەهوانی، بزوێنەری ئارەزووی سێکسی، سێکسی ◌ شهوتانگیز، شهوانی، جنسی
**erotica** /ɪˈrɒtɪkə, US ɪˈrɑːt-/ *noun, pl.*
هونەر یان ویژەی بزوێنەر، وێنە، فیلم، کتێب و نووسراوە بزوێنەرەکان ◌ هنر یا ادبیات شهوانی
**erotically** /-kli/ *adverb*
بزوێنەرانە، ئالۆشهێنەرانە، بە شێوەیەکی شەهوانی ◌ به طور شهوانی
**eroticism** /ɪˈrɒtɪsɪzəm, US ɪˈrɑːt-/ *noun*, also erotism /ˈɛrətɪz(ə)m/
ئارەزووی سێکسی، شەهوانییەت، بزوێنەری، ئالۆشهێنەری، لایەنی بزوێنەری (ب.ت. لە کارە هونەرییەکاندا): *the film's blatant eroticism* ◌ شهوت، میل جنسی، شهوتانگیزی
**erotogenic** /ɪˌrɒtəˈdʒɛnɪk/ *noun*, also erotogenous /ˌɛrəˈtɒdʒɪnəs/ = erogenous
**erotology** /ˌɛrəˈtɒlədʒi/ *noun*
لێکۆڵینەوەی خۆشەویستی و هەڵسوکەوتی سێکسی ◌ اروتولوژی
**erotomania** /ɪˌrɒtə(ʊ)ˈmeɪnɪə/ *noun*
شێتی سێکسی، خولیای ئارەزووی سێکسی ◌ جنون جنسی
**errancy** /ˈerənsɪ/ *noun*
1 هەڵە، چەوتی 2 لادان ◌ 1 اشتباه 2 انحراف
**errand** /ˈerənd/ *adjective*
1 فەرمان، دەستوور 2 پەیام، فەرمانبەری، پەیامبەری، سپارشت، دەستووربەری، کارسپێری 3 کار ◌ 1 فرمان 2 پیغام، مأموریت 3 کار
**errant** /ˈerənt/ *adjective*
1 هەڵەکار، خەتاکار، لەرێدەرچوو، لاداو، خڕیایی 2 خەیانەتکار (هاوسەر) 3 بەرەڵا، سەرلێشێواو، دەربەدەر 4 سەربەگۆنگەڵ، گەڕاڵ، زۆرگەڕ، گەڕۆک ◌ 1 خاطی، منحرف 2 خائن (همسر) 3 ولگرد، سرگردان 4 ماجراجو، سیار
**errantry** /ˈerəntrɪ/ *noun*
سەرلێشێواوی ◌ سرگردانی
**erratic** /ɪˈrætɪk/ *adjective, noun*
I *adj* نائاسایی، ڕیزبەڕ، سەیر، ناڕێک، شێواو، شپرزە، وێڵەکی، سەرلێشێواو، پەرتەوازە، گەڕۆک 2 *n* *an erratic comet* :wandering مرۆی وازیوازی یان ڕارا ◌ *adj* 1 نابهنجار، غیرعادی، آشفته، سرگردان 2 *n* سیار آدم دمدمی
**erratically** /-kli/ *adverb*
ناڕێکانە، بە شێوەیێکی ناڕێک‌وپێک، بە شێوەیێکی شێواو ◌ به طور نامنظم
**erratic blocks** *noun, pl.*
بەردە سەرلێشێواو یان وێڵەکییەکان ◌ سنگ‌های سرگردان
**erratum** /eˈrɑːtəm/ *noun, pl.* errata
1 چەوتی، هەڵە (نووسین یان چاپ) 2 (errata) لیستەی هەڵەکان، هەڵەنامە ◌ 1 غلط 2 فهرست اشتباهات
**erratum slip** *noun*
هەڵەنامە، چەوتینامە ◌ غلطنامه
**erroneous** /ɪˈrəʊnɪəs, US ɪˈroʊ-/ *adjective*
(پڕ)هەڵە، نادروست، چەوت، شاش، ناڕاست ◌ غلط، مغلوط، اشتباه
**erroneously** /ɪˈrəʊnɪəsli, US ɪˈroʊ-/ *adverb*
بە هەڵە ◌ به اشتباه
**error** /ˈerə(r)/ *noun*
هەڵە، چەوت، چەوتی، شاش، لێ شێوان، خەتا، گوناح، سووچ، ڕادەی هەڵە: *made an error in adding up the bill* ◌ غلط، اشتباه، تقصیر، میزان اشتباه
**error message** *noun*
(کامپیوتێر) پەیامی هەڵە ◌ پیغام اشتباه
**ersatz** /ˈeəzæts, US ˈersɑːts/ *adjective*
ساختە، زڕ، فێڵ‌تیاکراو، قەڵب، دەسکرد، درۆ، فشە، ناڕاست، ناڕاستەقینە: *ersatz coffee* ◌ تقلبی، مصنوعی، تصنعی
**Erse** /ɜːs, US ɜːrs/ *noun*
زمانی گالی یان گالیکی Gaelic ئیرلەندی و سکاتلەندی ◌ زبان گیلی ایرلندی یا اسکاتلندی
**erst** /əːst/ *adverb*
(کۆن) لەوەپێش، جاران، بەری، پێشوو، زوو، پێش‌تر، لە ڕابردوودا، erstwhile ،long ago formerly ◌ قبلی، سابق، در گذشته، مدت‌ها پیش
**erstwhile** /ˈɜːstwaɪl, US ˈɜːrst-/ *adjective, adverb*
لەوەپێش، جاران، بەری، پێشوو، زوو، پێش‌تر، لە ڕابردوودا، formerly ◌ قبلی، سابق
**Ertebølle** /ˈɛːtəˌbɵːlə/ *noun*

فەرهەنگی دوایی‌یەکانی سەردەمی Mesolithic لە ڕۆژاوای باڵتیکدا (هەزارەی چوارەمی پێش‌زایین؛ بنەڕەت: لە ناوی *Ertebølle* لە ژووتلەند Jutlandی دانمارک) ◌ ارتبول

**erubescence** /ˌɛrʊˈbɛs(ə)ns/ *noun*
سووربوونەوە، سوورهەڵگەڕان، سوورداگەڕان ◌ سرخ‌شدگی

**erubescent** /ˌɛrʊˈbɛs(ə)nt/ *adjective*
سووربووەوە، سوورهەڵگەڕاو، سووورداگەڕاو ◌ سرخ‌شونده

**erucic acid** /ɪˈruːsɪk/ *noun*
(کیمیا) ترشەڵۆکی ئیروسیک $C_{22}H_{42}O_2$ ◌ اسید اروسیک

**eructation** /ˌiːrʌkˈteɪʃ(ə)n, ɪ-, ɛ-/ *noun*
قرقینە، قرپ، دەنگی گەروو ◌ آروغ

**erudite** /ˈerudaɪt/ *adjective*
زانا، زانیار، فرەزان، شارەزا: *an erudite scholar* ◌ فاضل، عالم، دانشمند

**eruditely** *adverb*
زانایانە ◌ دانشمندانه

**erudition** /ˌeruˈdɪʃn/ *noun*
زانیاری، زانست، زانایی ◌ علم، دانش، علامگی

**erumpent** *adjective*
دەتەقێتەوە، شەق دەبا، وەک دان یا سپۆرەکان ◌ منفجرشونده، شکوفنده

**eruption** /ɪˈrʌpʃn/ *noun*
1 تەقینەوە، هەڵچوون، فیشقان 2 دەس‌پێکردن، دەسپێک، سەرەتا 3 پەیدابوون، دەرکەوتن، دەرهاتن، سەردەرهێنان، هاتنەدەری، هەڵزلەیان، دەرکردن، هەڵتۆقین، هەڵپشکوتن 4 تەنینەوە 5 ئاژاوە، پشێوی، ئاڵۆزایی ◌ 1 فوران، انفجار 2 شروع 3 ظهور، بروز، بیرون‌زدگی 4 شیوع 5 آشوب

**eruptional** /ɪˈrʌpʃənl/ *adjective*
تەقینەوەیی، دەتەقێتەوە ◌ انفجاری

**eruptive** /ɪˈrʌptɪv/ *adjective*
تەقینەوەیی، هەڵچوو (eruptively *adv*) ◌ انفجاری، فوران‌کننده

**-ery (also -ry)** *suffix*
پاشگر: 1 پۆل، گروپ، کۆمەڵ، جۆر، چەشن: *greenery* 2 شوێن، جێ، ـگا، خانە، ـگە: *rookery*، *fishery*، *bakery*، *eatery* 3 هونەر، کردەوە، کار، پرەکتیس، چالاکی: *quackery*، *trickery*، *dentistry*، *archery*، *rivalry* 4 تایبەتمەندی، خەسڵەت: *snobbery* 5 دۆخ، هەلومەرج، باروودۆخ: *slavery* 6 کۆمەڵە، دەستە، خەڵک بە گشتی: *finery*، *greenery*، *machinery*، *Jewry*، *peasantry* (لە *-erie* فەرەنسەوە، لەسەر بنچینەی *-arius* و *-ator* لاتینەوە) ◌ پسوند: 1 گروه، نوع، گونه 2 مکان، محل 3 فن، پراکتیس 4 ویژگی 5 حالت

**eryngium** /ɪˈrɪndʒɪəm/ *noun, pl.* eryngiums
1 sea holly یان گیایێکی پێوەندی‌دار [تۆخم *Eryngium*] 2 ئێرینژیۆم: ڕەگی شەکرێنەکراوی sea holly، جاران وەک aphrodisiac بەکاردێنرا ◌ 1 نوعی گیاه 2 اریتژیوم

**eryngo** /ɪˈrɪŋɡəʊ/ *noun, pl.* eryngos or eryngoes = sea holly

**erysipelas** /ˌɛrɪˈsɪpɪləs/ *noun*
(پزشکی) باسوور، بای ماشەرە، سوورەبا، پێستەسوورە (بەهۆی streptococcus یەکەوە تووش دەبێ؛ erysipelatous *adj*) ◌ باد سرخ، حمره، باد مبارک

**erysipeloid** /ˌɛrɪˈsɪpəlɔɪd/ *noun*
(پزشکی) پێستەسۆی بەکتریایی دەستەکان ◌ اریسیپلوئید

**erythema** /ˌɛrɪˈθiːmə/ *noun*
(پزشکی) سووربوونەوەی پێست (erythematous *adj*؛ erythemic *adj*) ◌ التهاب پوست

**erythemal** *adjective*
سەربە سووربوونەوەی پێست ◌ وابسته به التهاب پوست

**erythematic** /ˌɛrəθɪˈmθɪk/ *adjective*
سوورهەڵگەڕێنەر ◌ التهاب‌آور

**erythorbate** *noun*
خوێی ترشەڵۆکی ئێریتۆربیک، ئێریتۆربات (وەک دژەئۆکسین(ـەر) لە خۆراکدا بەکاردێتریێ) ◌ اریتوربات

**erythorbic acid** *noun*
ترشەڵۆکی ئێریتۆربیک: ئاوێتەیێکی کریستاڵی یان بلووری $C_6H_8O_6$، تواو لە ئاودا، وەک ئانتی‌ئۆکسیدانت بۆ خۆراک بەکاردێتریێ ◌ اسید اریتوربیک

**erythrism** /ˈɛrɪθrɪz(ə)m/ *noun*
(گیانەوەرناسی) سوورهەڵگەڕانی نائاسایی (erythrismal *adj*؛ erythristic *adj*) ◌ اریتریسم

**-erythr(o)-** *suffix*
پاشگر: سوور، خڕۆکەی سوور: *erythrocyte* (بنەڕەت: لە *eruthros* یۆنانی‌یەوە "red") ◌ پسوند: سرخ، گویچەی قرمز

**erythrite** *noun*
ئێریتریت، سوورەکان: جۆرێ کانی زۆرتر سووررەنگ arsenate کە لە $Co_3As_2O_8.8H_2O$ کۆباڵتی ئاودار پێکهاتووە و ب.ت. لە کریستاڵە monoclinicـەکاندا هەیە ◌ اریتریت

**erythroblast** /ɪˈrɪθrə(ʊ)blast/ *noun*
ئێریترۆبلاست: خڕۆکەی سووری پێنەگەیشتوو یان ناهەراش، ناوکی nucleus تیایە ◌ اریتروبلاست

**erythroblastic** /ɪˈrɪθrə(ʊ)blast/ *adjective*
سەربە erythroblast، ئێریترۆبلاستی ◌ وابسته

به اریتروبلاست

**erythroblastosis** /ɪˌrɪθrə(ʊ)blasˈtəʊsɪs/ *noun*
بوونی ناسایی erythroblast ـەکان لە خوێندا ◌ اریتروبلاستوز، اریتروبلاستوسیس

**erythroblastotic** *adjective*
سەربە ئێریترۆبلاستۆز ◌ وابستە بە اریتروبلاستوسیس

**erythrocyte** /ɪˈrɪθrəsaɪt/ *noun*
خڕۆکەی سوور ◌ گلبول قرمز

**erythrocytic** *adjective*
سەربە خڕۆکەی سوور ◌ وابستە بە گلبول قرمز

**erythrogenic** /ɪˌrɪθrə(ʊ)ˈdʒɛnɪk/ *adjective*
(ژاراوی بەکتریایی) سوورهەڵگەڕێنەر ◌ التهاب‌آور

**erythroid** /ˈɛrɪθrɔɪd/ *adjective*
سەربە خڕۆکە سوورەکان ◌ وابستە بە گلبول‌های سرخ

**erythroleukaemia** /ɪˌrɪθrə(ʊ)luːˈkiːmɪə/ *noun*, US erythroleukemia
(پزشکی) جۆرێکی دەگمەن یان سەختی شێرپەنجەی خوێن leukaemia ◌ اریترولوکیمیا

**erythromycin** /ɪˌrɪθrə(ʊ)ˈmʌɪsɪn/ *noun*
ئانتی‌بیوتیکێ کە لە بەکتریایێکی streptomycete گیراوە یان بەدەست هێنراوە ◌ (*Streptomyces erythreus*) $C_{37}H_{67}NO_{13}$ اریترومایسین

**erythronium** /ˌɛrɪˈθrəʊnɪəm/ *noun*, erythroniums or erythronia /-ɪə/
گوڵەسوورە، گیای تیرەیێ کە dog's-tooth violet دەگرێتەوە [تۆخم *Erythronium*] ◌ نوعی گیاه

**erythropoiesis** /ɪˌrɪθrə(ʊ)pɔɪˈiːsɪs/ *noun*
بەرهەم‌هاتنی خڕۆکە سوورەکانی خوێن (وەک لە مۆخی ئێسکدا) ◌ تولید گلبول‌های سرخ خون

**erythropoietic** *adjective*
سەربە erythropoiesis ◌ وابستە بە erythropoiesis

**erythropoietin** /ɪˌrɪθrə(ʊ)pɔɪˈɛtɪn/ *noun*
(زیندەکیمیا) هۆرمۆنێ کە تاوی بەرهەم‌هاتنی خڕۆکە سوورەکانی خوێن و هیمۆگلۆبین دە مۆخی ئێسکا دەدا ◌ اریتروپوئیتین

**erythrosin** *noun*, also erythrosine
کۆمەڵە رەنگێ کە لە fluorescein ساز دەکرێن و رەنگی سوور یان سێیەری سوورباو بەرهەم دێنن ◌ اریتروسین

**Es** symb. the chemical element Einsteinium

**-es** *suffix*
پاشگر: 1 نیشانەی کۆ: *kisses*، نیشانەی کۆیە لە هێندێ ناوی تایبەت کە بە *o-* کۆتایی هاتووە: *potatoes* 2 نیشانەی سەردەمی ئێستا ◌ پسوند: 1 علامت جمع 2 علامت زمان حال

**ESA** *abbreviation* European Space Agency
ئاژانسی بۆشایی (والایی) ئەورووپا ◌ ئی‌اس‌ای

**Esau** /ˈiːsɔː/ *noun*, from Hebrew *'Ēsāw*
عیسو: کورەگەورەی ئیسحاق Isaac و ریبێکا Rebeka و برای یەعقووب Jacob ◌ عیسو

**escadrille** /ˌɛskəˈdrɪl/ *noun*
بەرەک یان سکادرانی فڕۆکەی فەرەنسە ◌ اسکادران هواپیمای فرانسه

**escalade** /ˌɛskəˈleɪd/ *noun*
1 (مێژوویی) بەلامار بە هۆی نەردیوانەوە، پەلامار بە پەیژە 2 سەرکەوتن، چوونەسەرێ، پیاهەڵچوون ◌ 1 هجوم به وسیله‌ی نردبان 2 صعود

**escalating** *adjective*
پەرەسێن، رووڵەزۆری، رووڵەپەرە ◌ فزاینده

**escalation** /ˌeskəˈleɪʃn/ *noun*
زۆربوون، چوونەسەرەوە، گرانبوون، سەرکەوتن، پەرەسەندن، بەرزەوەبوون، خراپتربوون ◌ افزایش، گسترش، تشدید

**escalator** /ˈeskəleɪtə(r)/ *noun*
پەیژەی سووڕاو، پلیکانی گەڕۆک یان جووڵۆک، پلیکانی تەسمەیی یان کارەبایی ◌ پله‌ی برقی

**escallonia** /ˌɛskəˈləʊnɪə/ *noun*
دەوەنێکی هەمیشەسەوزی ئەمریکای باشووری، بە گوڵی سپی یان پەمەیییەوە [تۆخم *Escallonia*] ◌ نوعی درختچه

**escallop** /ɪˈskaləp, ɛ-, -ˈskɒl-/ = escalope

**escalope** /ˈeskəlɒp, eˈskæləp, US ɪˈskɑːləp, ɪˈskæ-/ *noun*
ئێسکالۆپ (چێشت) ◌ اسکالوپ

**escapade** /ˌeskəˈpeɪd, US ˈeskəpeɪd/ *noun*
مەترسی‌کاری، جەربەزەیی، سەرلەکێشەخوران، ناجسنی، شلوقی، شەیتانی: *Isabel's latest romantic escapade* ◌ ماجراجویی، شیطنت

**escape** /ɪˈskeɪp/ *noun*
1 هەلاتن، دەرچوون، راکردن، رەف، رەفیان، دەربازبوون، رزگاربوون 2 رێگای دەرچوون، دەرەتان، دەروو، چارە 3 لێچوون، هاتنەدەرێ ◌ 1 فرار، گریز، رهایی، نجات 2 وسیله‌ی فرار، مفر 3 نشت

**escape clause** *noun*
رێگە یان مەرجی دەرچوون، دەرچوون لە هەڵومەرجێ ◌ شرط گریز

**escaped** /ɪˈskeɪpt/ *adjective*
راکردوو، هەلاتوو ◌ فراری

**escapee** /ɪˌskeɪˈpiː/ *noun*
راکردوو، هەلاتوو، راکردە، رەفیای (ب.ت. لە زیندان) ◌ فراری

**escape-hatch** *noun*
دەرچە یان درگای تەنگەتاوی یان دەرچوون

(کەشتی یان فڕۆکە) ۞ دریچەی نجات
**escapement** /ɪ'skeɪpmənt/ *noun*
چەرخەماشە، چەرخەدەنگ، چەکوشی سەعات (lever escapement = ماشە؛ چەرخەپۆلا = چرخ سفید) ۞ چرخ دنگ
**escape pipe** *noun*
لوولەی دەرچوون یان هەلاتن ۞ لولەی اطمینان
**escape valve** *noun*
دەمەوانەی دەرچوون یان هەلاتن ۞ دریچەی اطمینان
**escape velocity** *noun*
خێرایی دەرچوون (کەمترین خێرایی بۆ دەرچوونی تەن، ساتەلایت، مووشەک، کەشتی ئاسمانی و هتد لە هێزی راکێشان) ۞ سرعت گریز
**escapism** /ɪ'skeɪpɪzəm/ *noun*
راستینەویستی، دەرچوونگەری، دەرچوونخوازی، هەلاتن لە راستی: *the pure -apism of adventure movies* ۞ واقع‌گریزی
**escapist** /ɪ'skeɪpɪst/ *noun, adjective*
راستینەویست، دەرچوونگەر، دەرچوونخواز ۞ واقع‌گریز
**escapologist** /ˌeskə'pɒlədʒɪst, US -'pɑːl-/ *noun*
لەبەرچاولاچوو، ئێسکاپۆلۆژیست ۞ غیب‌شونده
**escapology** /ˌeskə'pɒlədʒɪ/ *noun*
بزربوون، وەندابوون، ونبوون، لەبەرچاونەمان (لە چاوبەستیدا؛ escapological /eˌskætəlɒdʒɪkl, US -lɑːl-/ *adj*) ۞ غیب شدن
**escargot** /ɛ'skɑːgəʊ, US ɪ-/ *noun, pl.* escargots
شەیتانۆکەی خۆراکی ۞ حلزون خوراکی
**escarole** /'ɛskərəʊl/ = endive
**escarpment** /ɪ'skɑːpmənt, US ɪ'skɑːrp-/ *noun*
تەلان، توندایی، لاپێ، سینەکێش، سەرەوخواری یا لێژایی خەنەک: *The clay lowlands are flanked by steep chalk escarpments* ۞ تنده، سرازیری خندق
**-esce** *suffix*
پاشگر: کار ساز دەکا، زۆرتر ئاماژە دەکا بە دەسپێکردنی کار: *effervesce* (هەلچوون، بلقەبلق‌کردن، کەف‌کردن، کولرشتن؛ بنەڕەت: لەو کارە لاتینییانە کە کۆتاییان بە *escere* هاتووە) ۞ پسوند: فعل‌ساز
**-escence** *suffix*
پاشگر: بوون، بوونە، دۆخ، بار، ڕەوش: *obsolescence* (بنەڕەت: لە فەرەنسەوە، یان لە *-escent* لاتینەوە) ۞ پسوند: شدن، حالت
**-escent** *suffix*
1 شەوقدەرەوە، رووناکیدەرەوە، رۆشناییدەرەوە: *opalescent* 2 دەسپێکەر: *frutescent* ۞ پسوند: 1 بازتاب‌گر 2 آغازکننده
**eschar** /'ɛskɑː/ *noun*
(پزشکی) قرتماغە؟، رەقیتە؟، پێستەبرین؟، وشکە ۞ خشک‌ریشه
**eschatological** /eˌskætə'lɒdʒɪkl, US -'lɑːdʒ-/ *adjective*
سەربە ئێسکاتۆلۆژی، سەربە پەسلانناسی یا مەعادناسی (eschatologically *adv*) ۞ معادشناختی
**eschatological movements** *noun, pl.*
بزووتنەوە پەسلاننایسییەکان ۞ نهضت‌های معادشناختی
**eschatology** /ˌeskə'tɒlədʒi, US -'tɑːl-/ *noun*
پەسلانناسی، مەعادناسی (لقێ لە یەزدانناسی، لەمەڕ دوایی‌هاتنی جیهان و دادگەری خوای بەشەریەت پاش مردن دەکۆلێتەوە) ۞ معادشناسی
**eschaton** /'ɛskətɒn/ *noun*
1 دوایین رووداوی پلانی خودایی 2 کۆتایی جیهان ۞ اسکاتون
**escheat** /ɪs'tʃiːt, US ɛs-/ *noun*
1 مافی خاوەنداریتی یان دەسبەسەراگرتنی دارایی کەسێکی مردوو کە میراتگرێکی قانوونی لە پاش بەجێنەماوە 2 ئەو داراییە ۞ اسچیت
**eschewal** /es'tʃuːəl/ *noun*
پرینگانەوە، دوورکەوتنەوە، پەرێز(ی)، کشانەوە، توخن‌نەکەوتن، خۆدوورگرتن ۞ اجتناب، پرهیز
**eschscholzia** /ɪs'ʃɒlzɪə, US ɛʃ'ʃɒlzɪə/ *noun*, also eschscholtzia /-tsɪə/
کۆکەناری ئەمریکای باکووری، بە گولی زەردی گەش، پرتەقالی یان سوورەوە [تۆخم *Eschscholzia*: چەندین جۆرن، بە تایبەتی California poppy] ۞ خشخاش امریکایی
**escolar** /ˌɛskə'lɑː/ *noun*
ماسییەکی دەریایی دریزی راوی، ماسییەچاویلکە [خێزان Gempylidae: چەندین جۆرن] ۞ نوعی ماهی
**escort** /'eskɔːt, US 'eskɔːrt/ *noun*
1 پاریزەر، پاسەوان، پاریزوان، بەدرەقە، ئیسکۆرت، دەستەی نۆبەداران 2 پاراستن، ئاگالیبوون، چاوبەسەرەوەبوون، بەرێ‌کردن، لەگەلچوون 3 لەگەل، هاورێ ۞ 1 اسکورت، محافظ 2 محافظت، همراهی 3 همراه
**escritoire** /ˌɛskriː'twɑː/ *noun*
میزی (لەسەر)نووسین ۞ میز تحریر
**escrow** /ɪ'skrəʊ, US ɛ-/ *noun*
(ماف) ریکەوتننامە، قەبالە یان بەلگەی جێبەجێ‌کردن (یان راپەراندن) ۞ سند تضمینی

**escudo** /ɛ'sk(j)u:dəʊ, US ɛ'ʃk-/ *noun, pl.* escudos
یەکەی بنەڕەتی پارەی پۆرتوگال و Cape Verda، بەرامبەر بە سەد centavo ◌ اسکودو

**esculent** /'ɛskjʊlənt/ *noun, adjective*
(شتێکی) خۆراکی، لەخواردنهاتوو، دەخورێ ◌ (چیز) خوردنی

**escutcheon** /ɪ'skʌtʃn/ *noun*
1 مەتاڵ بە نیشانەی بنەماڵەییەوە، دروشمی بنەماڵەیی 2 مەتاڵ، قەڵغان 3 بەشێ لە نێوەڕاستی دواوەی کەشتی کە ناوی کەشتییەکەی پێوەیە) 4 ڕووپۆش، سەرپۆش، سەرقاپ (ی قفڵ؛ بنەڕەت: لەسەر بنەمای scutum لاتین "shield") ◌ 1 سپر با علامت خانوادگی 2 سپر 3 اسکاچن، روپوش

**Esd.** *abbreviation* Esdras (in biblical references)

**Esdras** *noun*
1 عیزرا، ئێزدریس: هەریەک لە دوو کتێبی قانوونی (شەرعی) کلێسەی کاتۆلیکی ڕۆم، سەربە پەیمانی کۆن 2 = Ezra 3 = Nehemiah ◌ عزرا

**-ese** *suffix*
پاشگر: 1 سەربە یان تایبەت بە وڵات یان جێگایێ: *Taiwanese*، *Japanese* 2 سەربە زمانێکی تایبەت: *Japanese* *Cantonese* 3 دانیشتوو، خەڵکی: *Chinese* 4 شێوازی زمان: *journalese* *baseballese* (بنەڕەت: لە *-eis* فەرەنسی کۆن، لەسەر بنچینەی *-ensis* لاتین) ◌ پسوند: 1 وابسته به کشور یا جایی 2 به زبان مخصوصی 3 مقیم 4 سبک زبان، لهجه

**eserine** /'ɛseri:n/ = (Chemistry) = physostigmine

**-esis** *suffix*
پاشگر: 1 کار، کردە 2 پێکهێنان، بنیاتنان ◌ پسوند: 1 عمل 2 ایجاد

**Esk.** = Eskimo

**esker** /'ɛskə/ *noun*
(زەویناسی) ئێسکێر: زوورگ یان بەندەلەبەندێکی درێژ و باریک و پێچەڵاوپێچ کە لە نیشتنی زیخ و وردەبەرد، ریک sand و boulder ـەکانی بەفراوەکان meltwater لە ئەنجامی پاشەکشێی سەهۆڵڕووبار glacier یان تەختەسەهۆڵێ پێکدێن؛ تیغەشانێکی پێچاوپێچ serpentine لە ڕامالەی لم یان زیخوچەو، بەهۆی تواوکاوی سەهۆڵڕووبار ◌ اسکر

**Eskimo** /'ɛskɪməʊ, US -moʊ/ *noun, adjective, pl.* Eskimos
*n* ئێسکیمۆ، زمانی ئێسکیمۆیی *adj* ئێسکیمۆیی، سەربە ئێسکیمۆکان ◌ *n* اسکیمو، زبان اسکیمویی *adj* وابسته به اسکیموها

**Eskimo-Aleut** *noun, adjective*
*n* ئێسکیمۆئالیوتی، خێزانی زمانانی ئینوئیت Inuit، یوپیک Yupik و ئالیوت Aleut *adj* سەربەو خێزانە زمانییە ◌ اسکیمو-آلیوتی

**Eskimo curlew** *noun*
ئەحمەدڕاوکەری ئێسکیمۆیی: جۆرێ ئەحمەدڕاوکەری چکۆلەی جیهانی نوێ، سەری ڕیزێیە، ئێستا خەریکی قڕی تێدەکەوێ [*Numenius borealis*] ◌ نوعی پرنده

**Eskimo dog** *noun,* also husky
1 جۆرێ نژادی سەگی بەهێز و دەستە کە تووکێکی پڕ و زبری هەیە،لە ناوچە جەمسەرییەکانی باکووری بۆ ڕاو و ڕاکێشانی خێشک بەکاردێترێ 2 سەگێکی باکووری ئەمریکای باکووری کە بۆ ڕاکێشانی خێشکەکان بەکاردێترێ ◌ نوعی سگ

**ESL** /,i: es 'el/ *abbreviation* English as a Second Language
ئینگلیسی وەکوو زمانی دووەم (یا دووهەم) ◌ انگلیسی به عنوان زبان دوم

**ESN** *abbreviation* 1 educationally subnormal 2 electronic serial number
1 دواکەوتوو لە باری خوێندنەوە 2 ژمارەی زنجیرەی ئێلیکترۆنیک ◌ 1 عقب‌افتاده‌ی تحصیلی 2 عدد سریال اکترونیک

**ESOL** /'i:sɒl, US -sɑ:l/ *abbreviation* English for speakers of other language
ئینگلیسی بۆ قسەپێکەرانی زمانانیتر ◌ ایسول

**esophageal** *adjective*
سەربە سوورێنچک، سوورێنچکی، سوورێنچکەیی ◌ وابسته به مری

**esophagus** /ɪ'sɒfədʒəs/ *noun,* US spelling of oesophagus etc.
سوورێنچک، سوورێنچکە ◌ مری

**esoteric** /,esə'terɪk, US ,i:sə-/ *adjective*
1 ڕازاوی، ڕازمەند، ڕەمزاوی، نەهێنی، نەتەنی، دەروونی، شاراوە، نێوەکی، بەنامەکی، بنەکی، تایبەتی 2 نادیار، تەماوی، ئاڵۆز، پێچەڵاوپێچ: *esoteric subjects* ◌ 1 مرموز، سری، داخلی، اختصاصی 2 غامض، پیچیده

**esoterica** /,ɛsə'tɛrɪkə, US ,i:sə-/ *noun, pl.*
شتە نەهێنی یان ڕەمزاوییەکان ◌ امور مرموز

**esoterically** /,esə'terɪkli, US ,i:sə-/ *adverb*
بە شێوەیەکی ڕەمزاوی، ڕازمەندانە، بە شێوەیێکی ڕازاوی ◌ به طور مرموز

**esoteric buddhism** *noun*
(فەلسەفە) بووداگەری نەهێنی ◌ بوداگروی خفی

**esoteric knowledge** *noun*
(فەلسەفە) نالیجی نەهێنی ◌ معرفت خفی

**esp** *abbreviation* especially
بەتایبەت ◌ به ویژه

**ESP** /ˌi: es ˈpi:/ *abbreviation* English for Special Purposes; extrasensory perception
1 ئینگلیسی بۆ مەبەستە تایبەتییەکان 2 تێگەیشتن یان پێزانینی سەرووهەستی ◌ 1 انگلیسی برای مقاصد خاص 2 ادراک فراحسی
**espada** /ɛˈspɑ:də/ *noun, pl.* same
شمشێرە، جۆرێ scabbarfish ◌ اسپادا
**espadrille** /ˈespədrɪl/ *noun*
کەلاش، کلاش ◌ گیوه
**espalier** /ɪˈspæliə(r)/ *noun*
1 داربەس(ت)، کەلەژ، قایمەمێو 2 داری داربەسدار ◌ 1 چفته 2 درخت چفته‌دار
**esparto** /ɛˈspɑ:təʊ, US ɪ-/ *noun,* also esparto grass
گوریسە؟، جۆرێ گیای زبر، رەسەنی ئەفریکای باکووری و سپانیا، بۆ گرتنەوەی گوریس و هتد بەکاردێترێ [*Stipa tenacissima*] ◌ اسپارتو
**especial** /ɪˈspeʃl/ *adjective*
تایبەتی، نەمازە، ئاوارتە(یی)، نائاسایی: *a sent -cial* ◊ *matter of especial importance greetings to his son* ◌ خاص، ویژه، استثنایی
**especially** /ɪˈspeʃəli/ *adverb*
بەتایبەت، (بە) دانستە، نەخوازەلا، یەکجار زۆر، گەلێ ◌ به ویژه، مخصوصاً، خیلی
**Esperanto** /ˌespəˈræntəʊ, US -toʊ/ *noun*
(زمان) ئێسپێرانتۆ، ئیسپرانتۆ (لە 1887) ◌ اسپرانتو
**espial** /ɪˈspʌɪ(ə)l, US ɛ-/ *noun*
(کۆن) سیخوڕی، جاسووسی ◌ جاسوسی
**espionage** /ˈespiənɑ:ʒ/ *noun*
سیخوڕی، شووفاری، زیرەڤانی، جاسووسی ◌ جاسوسی
**esplanade** /ˌespləˈneɪd/ *noun*
ڕێگای کەناری، سەیرانگا، شوێنی بەربلاو ◌ گردشگاه ساحلی
**espousal** /ɪˈspaʊzl/ *noun*
1 پشتیوانی، پشتگیری، لایەنگری، داکۆکی 2 ژنومێردایەتی ◌ 1 حمایت، هواداری 2 زناشویی
**espressivo** /ˌɛsprɛˈsi:vəʊ/ *adverb, adjective*
(موسیقا) لەگەڵ دەربڕینی کوڵوکۆ و هەستەوە ◌ همراه با ابراز احساسات
**espresso** /eˈspresəʊ, US -soʊ/ *noun,* also expresso
ئێسپریسۆ، فنجان یان پیالەی ئێسپریسۆ (جۆرێ قاوەی رەشی توند) ◌ اسپرسو
**esprit** /ɛˈspri:, French ɛspʀi/ *noun*
1 رۆح، گیان، کەیف، بەکەیفی، بەدەماخی، خۆشی، سەرخۆشی 2 = esprit de corps ◌ روح، نشاط، سرزندگی
**esprit de corps** /ɛˌspri: də ˈkɔ:, French ɛspʀi də kɔʀ/ *noun*
گیان یان هەستی یەکگرتوویی، وورەی دەستەگەری، گیانی یەکگرتوویی لەنێوان ئەندامانی دەستەیەکدا ◌ روح همبستگی
**Esq** *abbreviation* Esquire
بەرێز، ڕێزدار، جەنابی بەرێز ◌ جناب آقای
**Esquimau** pl. Esquimaux = Eskimo
**Esquire** = Esq
**-esque** *suffix*
پاشگر: بە شێوەی، بە (ێی) شێوازی، لێچوو، وەک، وەکوو، ـــ ئانە، ئاسا: *Dantesque*، *statuesque* (بنەڕەت: لە فەرەنسەوە، لە ڕێگای ئیتالیاییەوە، لە *-iscus* لاتینی سەدەکانی نیوەڕاست) ◌ پسوند: مانند، شبیه
**-ess**[1] *suffix*
پاشگر: نیشانەی مێیەتی: *giantess* ،*abbess* (بنەڕەت: لە *-esse* فەرەنسەوە، لە ڕێگای late Latin لە *-issa* یۆنانییەوە) ◌ پسوند: علامت تأنیث
**-ess**[2] *suffix*
پاشگر: abstract nouns لە ئاوەڵناو دروست دەکا، وەک *largess* (بنەڕەت: لە *-esse* فەرەنسەوە، لە *-itia* لاتینەوە) ◌ پسوند: اسم معنا را می‌سازد
**essay** /ˈeseɪ/ *noun*
1 وتار، نفیسار، نووسراوە 2 نێنشا 3 تاقیکاری 4 حەول، کۆشش 5 دەستیدان ◌ 1 مقاله، جُستار 2 انشا 3 آزمایش 4 کوشش 5 مبادرت
**essayer** *noun*
وتارنووس، نفیسارنووس ◌ مقاله‌نویس
**essayist** /ˈeseɪɪst/ *noun*
وتارنووس ◌ مقاله‌نویس
**esse** /ˈesi/ *noun*
(فەلسەفە، لە لاتینەوە) بوون، گەوهەر یان سروشتی بنەڕەتی (بنەڕەت: لە لاتینەوە بە واتای بوون to be) ◌ هستی
**essence** /ˈesns/ *noun*
1 گەوهەر، کرۆک، سروشت، ئێسێنس 2 کورتە، پوختە، نیویشک 3 مایە، ماک، پێزە، بنەڕەت، بنەما، بنچینە، بنگەهـ 4 شیلە، ئاووگ: *essence of rosewood* (لـــە بریتانیـــا) 5 گـولاو، *coffee/vanilla/almond essence* عەتر ◌ 1 ذات، ماهیت، کنه 2 خلاصه 3 اصل، اساس 4 عصاره 5 عطر
**Essene** /ˈesi:n/ *noun*
ئەندامی تیرەی کۆنی جوولەکەی پارێزگاری سەدەی 2ی پێشزایین و سەدەی 2ی پاشزایین لە فەلەستین (Essenian or Essenic *adj*؛ Essenism *n* بنەڕەت: لە *Essēnoi* یۆنانییەوە، ڕەنگە ئارامی بێ) ◌ اسین
**essential** /ɪˈsenʃl/ *adjective, noun*
1 *adj* پێویست، پێدڤی، بنچینەیی، گەوهەری،

بنەڕەتی، بنەمایی، بنگەهی، سەرەکی، گرنگ،
an :necessary ،indispensable ،basic
essential part/ingredient/component of
essential services such as ◊ something
،گەوهەری 2 gas, water and electricity
-al :idiopathic = 3 کرۆکی، زاتی، سروشتی
1 n essential hypertension ◊ disease
هۆکاری بنەڕەتی یان پێویست 2 شت یان
ڕەگەزی (یان توخمی یەکجار) پێویست 3
(essentials) بنەماکان، بنچینەکان، پێزەکان،
ماکان، بنەڕەتەکان، شتە پێویستەکان ◊ 1 adj
ضروری، لازمه، واجب، بنیادی، اساسی، مهم 2
ذاتی، ماهوی، طبیعی 3 اسنشل n 1 عامل اصلی یا
ضروری 2 شی یا عنصر ضروری 3 (در جمع)
مبانی، مقدمات، اصول، ضروریات

**essentially** /ɪˈsenʃəli/ *adverb*
لە بنەڕەتدا، لە تەرکەنەدا، لە ڕاستیدا،
*He was,* :fundamentally ،basically
◊ *essentially, a teacher, not a manager*
در اصل، در واقع

**essentialism** *noun*
کرۆکباوەڕی، کرۆکگەری، ـخوازی،
گەوهەرخوازی ◊ ماهیت‌گرایی

**essentialist** *noun*
کرۆکباوەڕ، کرۆکگەر، کرۆکخواز،
گەوهەرخواز ◊ ماهیت‌گرا

**essentiality** /ɪˌsenʃɪˈæəti/ *noun*
پێویستی، پێویستبوون، پێویستیتی ◊ وجوب

**essentialness** *noun*
پێویستی، پێویستبوون، پێویستیتی ◊ وجوب

**essential oil** *noun*
ڕۆنی عەتر، عەترەڕۆن ◊ روغن اسانس

**est.** *abbreviation* 1 established 2 estimate(d)
1 دامەزراو(ی)... 2 هەڵسەنگاندن، نرخاندن،
قەبلاندن، مەزندەکراو، هەڵسەنگێنراو ◊ 1
تأسیس... 2 تخمین، برآوردشده

**EST** /ˌi: es ˈti:/ *abbreviation* Eastern Standard Time
(لە ئەمریکا) کاتی پێوانەی ڕۆژهەڵات ◊
ای‌اس‌تی

**-est**¹ *suffix forming the superlative of adjectives*
پاشگر: ـترین، هەرە: بۆ پلەی باڵا یان هەرەی
ئاوەڵناو و ئاوەڵکارەکانی تاکبڕگەیی
بەکاردێتری: *shortest ،latest ،fattest* یان
هێندێ ئاوەڵناو و ئاوەڵکاری دووبڕگەیی:
*،oftenest ،luckiest* و کەمتر هی بڕگەی
درێژتر: *beggarliest* (بنەڕەت: لە *-ost-، -ust-،*
*-ast-* ئینگلیسی کۆنەوە) ◊ پسوند: ـترین

**-est**² **(or st)** *suffix*
پاشگر: زوو بۆ دووهەم کەسی تاک (لە کارە
ئینگلیسی‌یەکاندا (و لە سەردەمی ئێستا)
بەکاردێتری: *goest* (بنەڕەت: لە *-est، -ast، -st*
ئینگلیسی کۆن) ◊ پسوند: ــدر قدیم برای دوم
شخص مفرد به کار می‌رفت

**established** /ɪˈstæblɪʃt/ *adjective*
چەسپیو، داکوتراو، بنجبەست، جێگیر، سەقامگیر،
لەمێژینە، دێرین، هەمیشەیی، درێژخایەن، فەرمی
◊ تثبیت‌شده، دیرینه، دائمی

**established church** *noun*
کلێسەی فەرمی ◊ کلیسای رسمی

**established religion** *noun*
ئایین یان دینی فەرمی، ئۆلی فەرمی ◊ مذهب
رسمی

**establishment** /ɪˈstæblɪʃmənt/ *noun*
1 دامەزراندن، دانان، سازدان، بنیاتنان،
سەقامگیرکردن، جێگیرکردن، داکوتاندن،
داکوتان، دامەزران، تێ‌نیشتن، بنیاتنران 2
دەزگا، دەزگاوبەرە، دووکان، دامەزرە،
دامەزراوە، دامودەزگا 3 کۆمەڵە قانوون 4
کلێسەی فەرمی 5 دەس‌پێکردن، دەس‌بەکاربوون،
(the Establishment) 6 کەوتنەکار
دەس‌ڕۆیشتووان، دەسەڵاتداران، ڕایەداران،
دەسەڵاتبەدەستان، هێزبەدەستان، دەسداران،
چینی سەردەست، کۆمەڵی کلیلی، دەزگای
دەسەڵاتدار ◊ 1 تأسیس، تشکیل، برقراری،
استقرار، تشکل 2 مؤسسه، بنگاه، تشکیلات 3
مجموعه‌ی قوانین 4 کلیسای رسمی 5 آغاز 6 (the
E.) صاحبان قدرت، زمامداران، نظام موجود

**establishmentarian**
/ɪˌstablɪʃm(ə)nˈtɛ:rɪən/ *adjective, noun*
*adj* لایەنگری یان سەربە بنەمای established
*n* Church کەسێکی لایەنگری کلێسەی فەرمی
◊ استابلیشمنتارین

**estafet** /estəˈfet/ *noun,* also estafette
چەپەر ◊ قاصد

**estaminet** /ɛˈstamɪneɪ, French ɛstaminɛ/ *noun*
قاوەخانە (= خواردنەوەی ئەلکۆلی دەفرۆشی)
◊ کافه

**estancia** /ɛˈstansɪə/ *noun*
(لە سپانیایی‌یەوە) وێسگە، جێگایێکی بەرفراوانی
بەخێوکردنی ماڵات لە ئەمریکای لاتین و
باشووری ئەمریکا ◊ استانسیا

**estate** /ɪˈsteɪt/ *noun*
1 زەوی‌وزار، مڵک، زەوی، خاک، زەمین 2
شارۆچکە (پێشکەوتوو) 3 میرات، کەلەپوور 4
دارایی، ماڵ، سامان، هەیەوونییە: *a 3000-acre*
*estate* 5 پلەوپایە، پۆست، پێگە 6 دۆخ، ڕەوش،
کاودان، بارودۆخ 7 گرووپی سیاسی یان ڕامیاری
8 چینی کۆمەڵایەتی 9 (ماشین) ئێستەیشن ◊
1 ملک، زمین 2 شهرک 3 ماترک 4 دارایی 5 رتبه،

شـأن، منزلـت 6 حالـت، شـرایط، وضـع 7 گـروه سیاسی 8 طبقه‌ی اجتماعی 9 استیشن

**estate agency** *noun*

ئاژانـــسی کــرین و فرۆشـــتنی خانووبـــه‌ره و زه‌وی(وزار)، بریکاری سـه‌ودای مـلک ◌ بنگـاه معاملات ملکی

**estate agent** *noun*

ده‌لالی خانووبه‌ره‌و زه‌وی ◌ دلال معاملات ملکی

**estate car** *noun*

ماشینی ئیسته‌یشن ◌ اتومبیل استیشن

**estate tax** = inheritance tax

**esteem** /ɪ'sti:m/ *noun*

ریز، نرخ، حورمه‌ت، قه‌در، وه‌ج، بره‌و، روومه‌ت، بایه‌خ: *She is held in high esteem by her colleagues* ◌ احترام، اعتبار، ارجمندی، نظر

**ester** /'estə(r)/ *noun*

(کیمیا) ئیستیر: ئاویته‌یه‌کی ئه‌ندامی که به‌هۆی جیگۆرکێی هایدرۆژینی ترشه‌لۆکی له لایه‌ن ئالکیل یا کۆمه‌ڵێ ئه‌ندامی تر پێکهاتووه ◌ استر

**esterase** /'ɛstəreɪz/ *noun*

(زینده‌کیمیا) ئیستیراز: هه‌وێنه‌یێ که ئیستیره تایبه‌تی یه‌کان شی ده‌کاته‌وه بۆ ترشه‌لۆکه‌کان، ئه‌لکۆله‌کان و فێنۆله‌کان ◌ استراز

**esterification** *noun*

ئیستیراندن، ئیسترین، ئه‌سته‌رین ◌ استرکردن

**Esther** *noun*, Latin, from Hebrew *Estēr*, Esth. *abbreviation* Esther

1 ئیستیر، ئیستیر: ژنه‌قاره‌مانی جووله‌که‌ی کتێبی ئیستیر سه‌ربه په‌یمانی کۆن 2 Old Testament کتێبی ئیستیر ◌ استر

**esthesia** /es'θo:ʒə/ *noun*

هه‌ست(کردن)، هه‌ستیاری ◌ احساس، حساسیت

**esthesio-** *prefix*

پێشگر: هه‌ست(کردن) ◌ پیشوند: احساس

**esthesis** *noun*

هه‌ست، هه‌ست(پێ)کردن ◌ حس، احساس

**esthete, esthetic etc** = US spelling of aesthete, aesthetic etc

**Estima** /ɛ'sti:mə/ *noun*

جۆرێ په‌تاته‌ی هوڵه‌ندی ◌ استیما

**estimable** /'estɪməbl/ *adjective*

به‌ریز، جێی ریز، به‌وه‌ج، به‌روومه‌ت، ماقووڵ، به‌نرخ، لێوه‌شاو، شیاوی ریزلێنان ◌ محترم، گرامی، درخور احترام

**estimate** /'estɪmət/ *noun*

1 نرخاندن، قه‌بلاندن، هه‌ڵسه‌نگاندن، سه‌نگان، قرساندن، لێکدانه‌وه 2 لێکدانه‌وه‌ی خه‌رج‌وبار، مه‌زنده‌ی تێچوون یان خه‌رج‌وبار 3 مه‌زنده 4 راده‌ربرین ◌ 1 برآورد، تخمین، ارزیابی 2 برآورد هزینه 3 حدس 4 اظهارنظر

**estimated** *adjective*

مه‌زنده‌کراو، لێکدراوه‌دراو، هه‌ڵسه‌نگێنراو، نرخێنراو ◌ تخمینی، برآوردشده

**estimation** /ˌestɪ'meɪʃn/ *noun*

1 بۆچوون، را، دیتن 2 نرخاندن، هه‌ڵسه‌نگاندن، لێکدانه‌وه، مه‌زنده(کردن)، قه‌بلاندن، قرساندن: *Who is the best candidate in your estimation ?* 3 ریز، روومه‌ت، باوه‌ری، وه‌ج، روومه‌ت، قه‌در، قه‌درگرتن، ریزگرتن ◌ 1 نظر 2 ارزیابی، تخمین، برآورد 3 احترام، اعتبار، قدردانی

**estival** = US spelling of aestival, etc.

**estivation** = US spelling of aestivation

**Estonian** *noun, adjective*

*n* 1 خه‌ڵـــکی Estonia 2 زمـــانی Finno-Ugricی ئیستۆنیایی *adj* ســـه‌ربه ئیستۆنیا، خه‌ڵکه‌که یان زمانه‌که‌ی ◌ استونیایی

**estoppel** /ɪ'stɒp(ə)l/ *noun*

نه‌هێشتن، به‌رگرتن، رێ‌گرتن ◌ منع

**estovers** /ɪ'stəʊvəz, ɛ-/ *noun, pl.* usu. common/right of estovers

(زۆرتـر مێژوویـی) پێداویـــستی(یـه‌کـان) ◌ ضروریات

**estradiol** = US spelling of oestradiol

**estranged** /ɪ'stremdʒd/ *adjective*

جیاوه‌بوو (ژن و مێرد)، تۆراو ◌ متارکه‌شده، قهر

**estrangement** /ɪ'stremdʒmənt/ *noun*

1 جیابوونـه‌وه، لێـک‌دابـران، لێـک‌تـه‌کینـه‌وه، جـــودایی، جودایـــه‌تی، دابـــران 2 تـــۆران، ده‌نگ‌دابرین 3 بێزاری، نه‌فیان، ساردبوونه‌وه 4 دووری، بێگانـه‌یی ◌ 1 جدایی 2 قهربودن 3 تنفر 4 غربت، بیگانگی

**estranger** *noun*

گیانه‌وه‌ری ئاوه‌کی، ته‌ره ◌ جانور آواره

**estrogen etc** = US spelling of oestrogen etc

**estrus etc** = US spelling of oestrus etc

**estuarial** *adjective*

estuarine /-rʌɪn/ ( ریزگه‌یی، سه‌ربه ریزگه *adj*: ریزگه‌یی، پێکهاتوو له ریزگه: *estuarine* (*estuarine animals ◊ currents* ◌ وابسته به مصب

**estuary** /'estʃuəri, US -eri/ *noun, pl.* estuaries

ریزگه، ده‌م یان زار(ک)ی رووبار ◌ مصب، خور

**estufa** /ɛ'stu:fə/ *noun*

1 دیویکی گه‌رم که Maderia ی تیاهه‌ڵده‌گیرێ تا بگا 2 ژێرخانێ که ئاوری داگیرساوی تیایه، وه‌ک شـوێنی کۆبوونـه‌وه‌ی سووریێـــسته‌کانی Pueblo (بنـه‌ره‌ت: ره‌نگـه لـه *tuphos* یونـانی "هه‌ڵم یان دووکه‌ڵ") ◌ استوفا

**esurience** /ɪ'sjʊərɪəns, US ɛ-/ *noun,* also esuriency /-sɪ/

برسێتی، نیز(اتی)، برچی‌بوون ◌ گرسنگی

**esurient** /ɪ'sjʊərɪənt, US ɛ-/ *adjective*
(دەگمـەن) برسـی، برچـی، greedy ,hungry
:esuriently /ɪ'sjʊərɪəntli, US ɛ-/ *adv*)
برسـی‌یانـە، بـە شـێوەیێکی برچی؛ بنـەرەت: لـە لاتینەوە) ۞ گرسنە

**ET** *abbreviation* 1 (in North America) Eastern time 2 extraterrestrial

**-et**[1] *suffix*
پاشگر: چکۆلە، ـگچکە، ـئۆک، ـئیلکە، ـەڵە، ـ ئۆلکە، ـئۆچکە، ـئۆکە، ـئۆلە، ـچە، ـژە، کۆمەڵە: cellaret ,baronet (بنـەرەت: لـە - ,-et ete فـەرەنسـی کـۆن) ۞ پـسـوند: کوچـک، چـە، مجموعە

**-et**[2] *suffix*
پاشگر: ناو دروست دەکا وەک comet، و زۆرتر ئاماژە بە کۆمەڵ یان خەڵکێ دەکا: athlete، octet (بنـەرەت: لـە ētēs- یۆنـانی) ۞ پـسـوند: گروه، مجموعه

**eta** /'i:tə/ *noun*
ئێتا (= حەوتەمین پیتی ئەلفوبێی یۆنانی: η ,H) ۞ اتیە

**ETA** *abbreviation* estimated time of arrival
ئـەو کاتـەی کـە لـەوە دەچـێ فڕۆکـە یـان شەمەندەفەر بگاتە پێشەوە، کاتی مەزندەکراوی گەیشتن یان هاتن (فڕۆکە، شەمەندەفەر و هتد، بڕوانە ETD) ۞ زمان تقریبی ورود

**etagere** /,ɛtə'ʒɛː/ *noun, pl.* same or etageres
(لە فەرەنسـەوە) پارچـە یـان شتێکی کـەلوپـەلی نێومالـە کـە چەنـدین رەفحـەی هەیـە، قەفەسـە، رەفحە(بەندان) ۞ اتاگر، قفسه

**et al.** /,et 'æl/ *adverb*, (also eta, Latin *et alii/ alia*)
و خەڵکانی‌تر، و شتەکانی‌تر، و ئەوانی‌تر، and others ۞ و دیگران، و چیزهای دیگر

**etamine** *noun*
ئێتامین: جۆرێ کوتالی فاستونی یان کەتانی سووکی شل‌چن(راو) یان تۆڕی؛ (ئەستێرەوانی) ئەستێرەی هەژدیها ۞ اتامین

**etatism** *noun*
ئێتاتیزم، دەوڵـەت‌گـەری، سۆشـیالیزمی حکومی state socialism ۞ اتاتیـسم، دولـت‌گرایـی، سوسیالیزم دولتی

**etatist** *adjective*
ئێتاتیـست، سـەربـە دەوڵـەت‌گـەری، سـەربـە سۆشـیالیزمی حکـومی ۞ اتاتیـسم، وابـستە بـە دولت‌گرایی، وابسته به سوسیالیزم دولتی

**etalon** /'ɛtəlɒn/ *noun*
(فەرەنسی، فیزیک) ئێتالۆن، پێوانە ۞ اتالون

**etc.** /,et 'setərə, US ,ɪt/ *adverb*
و هتد، هـەتا دوایی، و تـاد، تـا دوایی، و وەکوو ئـەو، و ئـەوانی تـر، و شـتەکانی هاوشێوەی تـر: ◊ *We talked about the contract, pay, etc. Remember to take some paper, a pen, etc.* ۞ و غیره

**et cetera** /ɛt'sɛt(ə)rə, US ɪt-/ = etc, also etcetera

**etceteras** *noun*
شتەکانی‌تر، تشتێن دن ۞ چیزهای دیگر

**etched** *adjective*
هەڵکۆڵراو، کۆڵراو ۞ کنده‌کاری‌شده

**etcher** *noun*
هەڵکۆڵ، کۆڵیار ۞ حکاک

**etching** /'etʃɪŋ/ *noun*
هەڵکۆڵـین، وێنـەی هەڵکۆڵـراو ۞ حکـاکی، تصویر حکاکی‌شده

**ETD** /,i: ti: 'di:/ *abbreviation* estimated time of departure
کـات یـان کـاتژمێری مەزنـدەکراوی ڕۆیـشتن (فڕۆکە، شەمەندەفەر و هتد)، ئەو کاتەی کە لەوە دەچێ فڕۆکـە یـان شـەمەندەفەر بـڕوا (بڕوانـە ETA) ۞ ساعت تقریبی حرکت

**Eteocles** *noun*
ئێتیۆکلیس: کوڕی ئۆدیپ Oedipus و ژۆکاستا Jocasta کـە بـە دەسـتی براکـەی Polynices کوژرا (لە میتولۆژی یۆنانی‌دا) ۞ اتیوکلس

**eternal** /ɪ'tɜ:nl, US ɪ'tɜ:rnl/ *adjective, noun*
1 بـێ‌سـەرەتا و کۆتـایی، ئـەزەلی و ئەبـەدی، هەمیشەیی، (هە)تاهەتایی، هەتایی، تاسەر، نەمر، جاوید، هـەرمان، ناکۆتـایی، ژیـانی پـاش مـەرگ (ی لـەش)، نەفـەوتاو، نـەگۆڕ، جـێگیر، the ◊ *eternal damnation* :everlasting یەکبینە، 2 *promise of eternal life in heaven* لەسـەریەک، یەکـریز، بێ‌پـسانەوە، perpetual: (the Eternal) خودا(ی نەمر) 3 *an -al flame* ۞ 1 ابدی، جاودان، اخروی، لایتغیر 2 بی‌وقفه 3 (the Eternal) خداوند

**eternal beauty** *noun*
جوانی هەمیشەیی یان نەمرانە ۞ زیبایی جاویدان

**the Eternal City** *noun*
ڕۆم Rome ۞ روم

**eternal home** *noun*
خانووی هەمیشەیی یان نەمرانە، جاویدخانە ۞ جاودان‌خانه

**eternal idea** *noun*
ئایدیای هەمیشەیی یان نەمرانە ۞ مثال جاودان

**eternal laws** *noun, pl.*
قانوونە هەمیشەیی یان نەمر یـان جاویـدەکان ۞ قانون‌های جاودان

**eternal life** *noun*
ژیانی پاش مەرگ (ی لەش) ۞ زندگی سرمدی

**eternally** /ɪ'tɜ:nəli, US -'tɜ:rn-/ *adverb*

(بۆ) هەمیشە، بێ‌وچان، لەسەریەک، یەکبینە:
◯ *women trying to look eternally young*
همیشه، همواره، بی‌وقفه

**eternalness** *noun*
هەتاهەتایی، هەمیشەیی، نەمری، جاویدی،
جاویدانی، نەمریتی، هەرمانی ◯ ابدیت،
جاودانگی

**eternal principle** *noun*
بنەما یان بنچینەی هەرمان، بنەما یان پرینسیپی
جاویدان ◯ اصل جاودان

**eternal process** *noun*
رەوت یان پرۆسێسی هەمیشەیی، پرۆسەی
هەمیشەیی ◯ فرایند ابدی

**eternal triangle** *noun*
سێگۆشەی دلداری، سێ‌کوچکەی دلداری ◯
مثلث عشق

**eternal verities** *noun, pl.*
راستی‌یە هەمیشەیی‌یەکان ◯ حقایق ابدی

**eternity** /ɪ'tɜ:nəti, US ɪ'tɜ:rn-/ *noun, pl.* eternities
1 بێ‌سەرەتایی و بێ‌کۆتایی، هەمیشەییتی،
هەمیشەیی‌بوون، نەمریتی، تاهەتاییتی،
هەتاهەتایی‌بوون، ناکۆتایی‌بوون، جیهانی
کۆتایی، ژیانی نەمرانە 2 ژیانی دوای مەرگ یان
جیهانی تر 3 مردن، مەرگ ◯ 1 ابدیت و ازلیت،
ابدیت، جاودانگی، زندگی جاوید 2 آخرت 3 مرگ

**Etesian wind** /ɪ'ti:ʒɪən, ɪ'ti:z-, ɪ'ti:ʒ(ə)n/ *noun*, also meltemi
(بای) ئیسان، ئێتان، ئیتیەن، سالی جاری
هەلدەکا ◯ اتان، ایتین

**eth** /ɛð/ *noun*, also edh
پیتێکی کۆنی ئینگلیسی ð یان Ð ◯ ات

**-eth**[1] *suffix* variant spelling of -th1 (as in *fiftieth*)

**-eth**[2] *suffix* (also -th)
پاشگر: (کۆن) بۆسازکردنی سێهەم کەسی تاک
لە کاری سەردەمی ئێستا بەکاردێنرێ: *doeth*
(بنەڕەت: لە *-th* ،*-ath* ،*-eth*- ئینگلیسی کۆن)
◯ پسوند: برای ساختن سوم شخص از فعل زمان
حال به کار می‌رفته

**-eth**[3] *suffix*
پاشگر: ئێتیل: *ethene* ◯ پسوند: اتیل

**ethacrynic acid** *noun*
ترشەلۆکی ئێتاکرینیک $C_{13}H_{12}Cl_2O_4$، ب.ت.
بۆ دەرمان یان چارەسەری edema بەکاردێنرێ
◯ اسید اتاکرینیک

**ethambutol** *noun*
دەرمانێکی پێکهێنراو یان سینتێتیک
$C_{10}H_{24}N_2O_2$، ب.ت. بۆ دەرمان یا چارەسەری
tuberculosis بەکاردێنرێ ◯ اتامبوتول

**ethanal** /'ɛθ(ə)nal/ = acetaldehyde

**ethanamide** /ɪ'θanəmʌɪd/ = acetamide

**ethane** /'i:θeɪn/ *noun*
ئیسان، ئێتان: جۆرێ گازی گڕگیش flammable،
بێ‌بۆ و بێ‌ڕەنگ $C_2H_6$، لە زنجیرەی میتان، لە
گازی سروشتی‌دا دۆزراوەتەوە و وەک (گازی)
سووتەمەنی‌یێ بەکاردێنرێ ◯ اتان

**ethanediol** /'i:θeɪn,dʌɪɒl, US 'ɛθ-/ = ethylene glycol

**ethanoic acid** /,ɛθə'nəʊɪk/ = acetic acid

**ethanol** /'eθənɒl, US -noʊl/ *noun*, also ethyl alcohol
ئیسانۆل، ئیتانۆل، ئێتانۆل ◯ اتانول

**ethene** /'ɛθi:n/ = ethylene

**ether** /'i:θə(r)/ *noun*
1 (کیمیا) ئیسێر، ئیتێر، ئێتێر: ئاوێتەیێکی ئەندامی
organic compound بە ئەتۆم یان
گەردیلەیێکی ئۆکسیژێن کە دوو کۆمەلی
ئالکایلی پێک دەبەستێتەوە 2 (هەروەها diethyl
ether و ethyl ether) شلەیێکی بۆن‌خۆشی
یەکجار گڕگیشی هەلمیوی volatile سووک
$C_4H_{10}O$ کە وەک دەرمانی بێ‌هۆشی (بەنگ)
anaesthetic و تویێنەر solvent بەکاردێنرێ 3
(فیزیک و مێژوویی، هەروەها aether) ئیتێر،
ئەسیر: مادەیێ کە زوو وادادەنرا کە بە هەموو
بۆشایی space (و تەنانەت مەودای نێوان
پارچۆلکەی تەنەکان پڕکردبێتەوە) بلاوبووبێتەوە
و ببێتە هۆی راگوێستنی رووناکی light (و
گەرما) 4 مەلبەندێ کە دەبێتە هۆی راگوێستنی
شەپۆلە رادیۆیی‌یەکان 5 (aether، وێژەیی و
کۆن) بەشی سەرەوەی ئاسمان، حەوا، هەوا،
ئاسمانی روون clear sky، ناوچە ژوورەکانی
هەوا و لەوبەری هەروەکانەوە (بنەڕەت: لە
فەرەنسی کۆن، یا بە ریگای لاتین لە *aithēr*
یۆنانی "هەوای ژووروو"، لە بنکی *aithein*
"shine ،burn") ◯ 1 اتر 2 (شیمی) اثیر 3
(فیزیک) اثیر 4 اتر 5 هوا، آسمان شفاف

**ethereal** /i'θɪəriəl, US i'θɪr-/ *adjective*, also ethereal or etheric /i:'θɛrɪk, US 'i:θ(ə)rɪk/
(فەرمی) 1 ئیسێری، سەربە ئیتێر 2 سووک و
ناسک tenuous، ئاسمانی: *ethereal music*،
ئاسمانی، heavenly 3 *her ethereal beauty*
celestial؛ مەعنەوی، خودایی، مانایی، نامادی،
immaterial، spiritual، unworldly،
intangible 4 سەربە ناوچە ژووروەکانی
بۆشایی یان ناوچە ئەوپەڕەکانی زەوی 5 سەربە
یان شێوەی ethyl ether دەدا یان تیایەتی،
ئیتێری کیمیایی تیایە. سەربە ئیتێری کیمیایی،
(گیراوەیێ) خاوەنی diethyl ether وەک
تویێنەرێ (etherealness *n* ؛ethereality *n*) ◯
1 اتری، وابسته به اتر 2 ملکوتی، روحانی، علوی،

غلوی 3، 4 و 5 اتری

**etherealization** *noun*
کردنە ئیتیریال، ئیتیریالاندن، ئیتیریالیزاسیۆن ◌ اتریالیزاسیون

**ethereally** /iˈθɪəriəli, US iˈθɪr-/ *adverb*
بە شێوەیەکی ئاسمانی ◌ بە طور ملکوتی

**ether extract** *noun*
بەشێکی مادەی ئەندامی کۆمپلێکس کە لە ئیتیردا دەتوێتەوە و زۆرتر لە چەوری‌یەکان و ترشەلۆکە چەورەکان پێکهاتووە ◌ اتر اکستراکت

**etherization** *noun*
1 ئیسیتراندن، ئیسیترین، ئیسەرین، ئیتیراندن 2 بێ‌هۆش‌کردن، سڕکردن، سڕاندن (بە ئیتیر) ◌ 1 اتریزاسیون 2 بی‌حس‌سازی، بی‌هوش‌سازی

**Ethernet** /ˈiːθənet, US ˈiːθərnet/ *noun*
ئیسیرنێت، ئیتیرنێت: ڕێکخستەیێ بۆ بەستنەوەی ژمارەیێ لە دەزگاکانی کامپیوتێری بۆ دارشتنی تۆڕێ، تێکەڵێ (network + ether ◌ اترنت

**ethic** /ˈeθɪk/ *noun*
*n* 1 ئاکار، ئەخلاق، دەزگا یا سیستمی ئاکاری یا بنچینە ئاکاری‌یەکان، تیۆری یان دەزگای بەها ئاکاری‌یەکان: *the present-day materialistic ◊ the Christian ethic ◊ ethic 2 professional/business/medical ethics* ڕەوشت، ڕەفتار، هەڵس‌وکەوت *adj* ئاکاری، ئەخلاقی ◌ *n* 1 اخلاق، نظام اخلاقی 2 رفتار *adj* اخلاقی

**ethical** /ˈeθɪkl/ *adjective*
ئاکاری، ئەخلاقی، لەباری ئاکاری‌یەوە دروست، بەئاکاریەسەندکراو: *ethical ◊ issues/standards/questions the ethical problems of human embryo research* ◌ اخلاقی، اخلاقاً درست یا مورد پسند

**ethical code** *noun*
یاسا و ڕێسای ئاکاری ◌ ضوابط اخلاقی

**ethical imperative** *adjective*
فەرمان یان دەستووری ئاکاری ◌ امر اخلاقی

**ethically** /-kli/ *adverb*
لەباری ئاکاری‌یەوە، لەباری ئەخلاقی‌یەوە: *The committee judged that he had not behaved ethically* ◌ اخلاقاً

**ethical philosophy** *noun*
فەلسەفەی ئاکاری ◌ فلسفەی اخلاقی

**ethical relativism** *noun*
ڕێژەگەریتی ئاکاری ◌ نسبت‌گرایی اخلاقی

**ethical relativist** *noun*
ڕێژەگەری ئاکاری ◌ نسبت‌گرای اخلاقی

**ethical socialism** *noun*
سۆشیالیزمی ئاکاری ◌ سوسیالیزم اخلاقی

**ethical terms** *noun, pl.*
زاراوە ئاکاری‌یەکان، زاراوەمەنی ئاکاری ◌ اصطلاحات اخلاقی

**ethical theology** *noun*
یەزدانناسی ئاکاری ◌ الهیات اخلاقی

**ethics** /ˈeθɪks/ *noun, pl.*
1 زانستی ئاکار، ئاکارناسی، ئاکار 2 فەلسەفەی ئاکار 3 بنچینەکانی ئاکاری یان بنچینە ئاکاری‌یەکان 4 لایەنی ئاکاری ◌ 1 علم اخلاق، اخلاق 2 فلسفەی اخلاق 3 اصول اخلاقی 4 جنبەی اخلاقی

**Ethiopian** /ˌiːθiˈəʊpiən/ *adjective, noun*
*adj* 1 ئیسۆپیایی، ئیتۆپیایی: سەربە ناوچەی جوگرافیایی گیانەوەری کە ئەفریکای خوار دەشتی سەحارا، کۆمەڵەدورگەی عەرەبی و جاروبار ماداگاسکاریش دادەگری 2 سەربە ئەتیۆپی، ئەتیۆپیایی *n* خەڵکی ئەتیۆپی، ئەتیۆپیایی ◌ اتیوپیایی

**Ethiopic** /ˌiːθiˈɒpɪk/ *adjective, noun*
*adj* ئیسۆپیایی، ئەتیۆپیایی *n* زمانی ئیسۆپیایی یان ئەتیۆپیایی ◌ *adj* اتیوپیایی *n* زبان اتیوپیایی

**ethmoid** /ˈɛθmɔɪd/ *noun, adjective*
سەرێتە، بێژنگە، بێژنگەیی (ئێسکی چوارگۆشەی بنی لووت، بەشێ لە کەڕاکەی سەر پێکدێنێ؛ بنەڕەت: لە *ēthmoeidēs* یۆنانی‌یەوە، لە *ēthmos* "سەرێتێک") ◌ غربالی، پرویزنی

**ethmoidal** /ˈɛθmɔɪdl/ *adjective*
سەرێتەیی، بێژنگەیی، سەربە بێژنگە، پێوەندی بە سەرێتەوە هەیە ◌ وابستە بە غربالی

**ethnic** /ˈeθnɪk/ *adjective, noun,* also ethnical /ˈeθnɪkl/
*adj* 1 گەلی، قەومی، ڕەگەزی، نژادی (کە نەریتێکی چاندی یان فەرهەنگی هاوبەشیان بێ) 2 سەربە گرووپێکی چاندی تایبەت 3 سەربە نەریتی فەرهەنگی ڕۆژاواوە نەبێ 4 (کۆن) = heathen *n* ئەندامی کەمینەیێکی ڕەگەزی یان نەتەوەیی ◌ *adj* 1 قومی، نژادی 2 وابستە بە گروە فرهنگی ویژە 3 اتنیک *n* عضو اقلیت قومی

**ethnically** /-kli/ *adverb*
لەباری گەلی‌یەوە یان نژادی‌یەوە، ڕەگەزی‌یانە ◌ از لحاظ قومی

**ethnic cleansing** *noun*
سڕینەوە، پاکتاو یا ڕامالینی نژادی یا ڕەگەزی ◌ پاکسازی نژادی یا قومی

**ethnicity** /eθˈnɪsəti/ *noun, pl.* ethnicities
ڕاستی سەربە نژاد یان ڕەگەزێ بوون، ڕەگەزیتی، نژادیتی، نەتەوایەتی: *aspects of ethnicity* ◌ قومیت

**ethnic minority** *noun*
کەمینەی نژادی ◌ اقلیت قومی

**ethno-** /ˈɛθnəʊ/ *prefix*
پێشگر: نژاد، ڕەگەز، گەل، نەتەوە، کۆمەڵی ڕەگەزی یا نژادی، کۆمەڵی چاندی، کۆمەڵی

فــەرهــەنگــی: *ethnography ethnocentric* (بنەڕەت: لە *ethnos* یۆنانی‌یەوە "nation") ◯ پیشوند: نژاد، ملت، گروه نژادی، گروه فرهنگی
**ethnocentric** /ˌeθnəʊˈsentrɪk, US ˌeθnoʊ-/ *adjective*
نژادپەرستی، ڕەگەزپەرستی، نژادپەرستانە ◯ قوم‌مرکزی، قوم‌پرستانه
**ethnocentrically** *adverb*
ڕەگەزپەرستانە، نژادپەرستانە ◯ از لحاظ قوم‌مرکزی، قوم‌پرستانه
**ethnocentrism** *noun*
نژادپەرستی ◯ قوم‌پرستی، قوم‌محوری
**ethnocultural** *adjective*
سەربە کۆمەڵێکی نژادی تایبەتی ◯ وابسته به گروه قومی خاص
**ethnographer** /eθˈnɒɡrəfə(r), US -ˈnɑːɡ-/ *noun*
لێکۆڵەری نژادەکان، نژادلێکۆڵەر ◯ قوم‌نگار
**ethnographic** /ˌeθnəˈɡræfɪk/ *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە ethnography ـەوە هەیە ◯ وابسته به قوم‌نگاری
**ethnography** /eθˈnɒɡrəfi, US -ˈnɑːɡ-/ *noun*
نژادلێکۆڵینەوە، نژادلێکۆڵەری، لێکۆڵینەوەی نژاد ◯ قوم‌نگاری
**ethnolinguistics** /ˌeθnəʊlɪŋˈɡwɪstɪks/ *noun*
زمانەوانی نژادی یان ڕەگەزی ( ethnolinguist /ˌeθnəʊlɪŋˈɡwɪst *n*) ◯ زبان‌شناسی قومی
**ethnological** /ˌeθnəˈlɒdʒɪkl, US -ˈlɑːdʒ-/ *adjective*, also ethnological
نژادناسی‌یانە، سەربە نژادناسی یان ڕەگەزناسی ◯ قوم‌شناختی
**ethnologist** /eθˈnɒlədʒɪst, US -ˈnɑːl-/ *noun*
نژادناس، ڕەگەزناس ◯ قوم‌شناس
**ethnology** /eθˈnɒlədʒi, US -ˈnɑːl-/ *noun*
نژادناسی، ڕەگەزناسی: لێکۆڵینەوەی تایبەتمەندی گەلە جیاوازەکان و جیاوازی و پێوەندی نێوانیان ◯ قوم‌شناسی
**ethnomusicologic** *adjective*, also ethnomusicological
سەربە ئێتنۆمیوزیکۆلۆژی ◯ وابسته به اتنوميوسيکولوژی
**ethnomusicologist** *noun*
ئێتنۆمیوزیکۆلۆژیست ◯ اتنوميوسيکولوژيست
**ethnomusicology** *noun*
لێکۆڵینەوەی موسیقای فەرهەنگ یان چاندە جیاوازەکان، موسیقاناسی فەرهەنگی یان چاندی ◯ اتنوميوسيکولوژی
**ethological** *adjective*
سەربە ethology ◯ وابسته به ethology
**ethologist** *noun*
ئێتۆلۆژیست ◯ اتولوژيست
**ethology** /iːˈθɒlədʒi/ *noun*
1 زانستی هەڵسوکەوتی گیانەوەری، ئاکارناسی گیانەوەری 2 لێکۆڵینەوەی هەڵسوکەوتی مرۆڤ و ڕێکخراوەی کۆمەڵایەتی لە ڕوانگەی زیندەناسی‌یانەوە ◯ 1 رفتارشناسی حيوانی 2 اتولوژی
**ethos** /ˈiːθɒs, US ˈiːθɑːs/ *noun*
1 خووخدە، گیان یان ڕۆحی گەل 2 ڕەوشت، تایبەتمەندی: *an ethos of public service* ◊ 3 بیروباوەڕ *the carefree Californian ethos* ◯ 1 خلقيات 2 ويژگی، خصيصه 3 اعتقادات
**ethyl** /ˈeθɪl, US ˈiːθaɪl/ *noun*
(کیمیا، وەک ئاوەڵناو) ئیسیل، ئەتیل، ئێتیل، بنەڕەتێکی ئالکایل $CH_3CH_2$، لە ئێتان ethane بەرهەم دێنرێ (ethylic *adj*) ◯ اتيل
**ethyl acetate** *noun*
(کیمیا) جۆرێ شلەی گڕکێشی (زوو)هەڵمیوی بێ‌ڕەنگی بۆن‌خۆش $C_4H_8O_2$، بۆ توێنەری پلاستیک بەکاردێنرێ ◯ الکل اتيليک
**ethyl alcohol** *noun*
ئەلکۆلی پزشکی، ئەلکۆهۆلی ئیسیلیک ◯ الکل اتيليک
**ethylbenzene** *noun*
جۆرێ هایدرۆکاربۆنی ئارۆماتیکی شل $C_8H_{10}$، زۆرتر بۆ بەرهەمهێنانی styrene بەکاردێنرێ ◯ اتيل‌بنزن
**ethyl cellulose** *noun*
هەریەک لە چەندین ماک و سابستەنسی تێرمۆپلاستیکی جۆراوجۆر کە ب.ت. لە بواری پلاستیک‌سازی و lacquer بەکاردێنرێ ◯ سلولز اتيل
**ethyl chloride** *noun*
جۆرێ شلەی گڕکێشی تیژی بێ‌ڕەنگی (زوو)هەڵمیو یان گازی $C_2H_5Cl$، ب.ت. وەک anaesthetic شوێنی بەکاردێنرێ ◯ کلريد اتيل
**ethylene** /ˈeθɪliːn/ *noun*
(کیمیا) ئیسیلین، ئێتیلین: 1 جۆرێ هایدرۆکاربۆنی unsaturated گڕکێشی گازی بێ‌ڕەنگ $C_2H_4$، لە گازی خەڵووزا دۆزراوەتەوە 2 کۆمەڵێکی هایدرۆکاربۆنی دووهاوهێزە $C_2H_4$، لە ئێتان دەگیرێ ◯ اتيلن
**ethylenedismine tetra-cetate** *noun*
(کیمیا) خوێی EDTA ◯ نمک ای‌دی‌تی‌ای
**ethylene dibromide** *noun*
جۆرێ ئاوێتەی شلی ژاراوی بێ‌ڕەنگ $C_2H_4Br_2$، ب.ت. وەک سەرخستەیێکی سووتەمەنی fuel additive لە بێنزینی سوورب‌داردا بەکاردێنرێ ◯ ديبروميد اتيلن

**ethylene glycol** *noun*
(کیمیا) گلیکۆلی ئیتیلین یان ئیسیلین: دیۆل diol یکی شلی خەست $C_2H_6O_2$، ب.ت. وەک دژەبەست و بۆ سازکردنی ریشالە polyester ـەکان بەکاردێتریێ ◌ گلیکول اتیلن

**ethylene oxide** *noun*
(کیمیا) ئاوێتەیێکی ژاراوی گڕکێشی بێڕەنگ $C_2H_4O$، ب.ت. بۆ قانگدان fumigation و sterilization بەکاردێتریێ ◌ اکسید اتیلن

**ethylenic** *adjective*
ئیسیلینی، ئیتیلینی، سەربە ئیتیلین ◌ وابسته به اتیلن

**ethyl ether** = ether 2

**ethyne** /ˈiːθʌɪn, US ˈɛθ-/ = acetylene

**-etic** *suffix*
پاشگر: ئاوەڵناو و ناو دروست دەکا، وەک: *peripatetic* ،*pathetic* (بنەڕەت: لە *–ētikos* یان *–ētikos* یۆنانی‌یەوە) ◌ پسوند: صفت‌ساز و اسم‌ساز

**etic** *adjective*
1 ئێتیک (= سەربە یان پێوەندی هەیە یان شیکاری ئەو دیاردە چاندی و فەرهەنگی‌یەکانە دەگرێتەوە کە لە روانگەی کەسێکەوە کە بەشدار نییە دەکۆڵدرێتەوە) 2 (زمانەوانی) ئێتیک (بنەڕەت: لە phon*etic* ـەوە، بڕوانە emic) ◌ 1 اتیک 2 (زبان‌شناسی) وایی، اتیک

**etic unit** *noun*
(زمانەوانی) یەکەی ئێتیک ◌ واحد وایی یا اتیک

**etiolated** /ˈiːtiəleɪtɪd/ *adjective*
1 زەردبوو، ژاکاو، سیس، زەردهەڵگەڕاو (گیاوگژ) 2 ڕەنگبزرکاو، زەردهەڵگەڕاو، زەردوکز، بێ‌گەشە، زەردوزایف، بێ‌گیان، سیسەڵە، بێ‌هێز، نەخۆش ◌ 1 پژمرده 2 رنگ‌پریده، بی‌رمق، بی‌روح، بیمار

**etiolation** *noun*
1 ژاکاوی، زەردبوویی، چرچبوون، سیس‌بوون 2 بێ‌هێزکردن، پێچوویی، لاوازی ◌ 1 پژمردگی 2 تضعیف، تضعیف‌شدگی

**etiological** *adjective*, also etiologic
سەربە هۆناسی ◌ علت‌شناختی

**etiologically** *adverb*
لەباری هۆناسی (نەخۆشی)یەوە ◌ از لحاظ سبب‌شناختی

**etiology** /ˌiːtɪˈɒlədʒɪ/ *noun*, US Spelling of aetology
1 هۆ، ب.ت. هۆدۆزی نەخۆشی یا هۆی نەخۆشی یان بارودۆخێکی نائاسایی 2 هۆناسی (لقێکی ناڵیج) ◌ 1 علت، علت‌شناسی 2 سبب‌شناسی

**etiquette** /ˈetɪket, US -kət/ *noun*
1 دابودەستوور، داب، نەریت، رەوشت، ڕێوڕەسم، ڕێوشوێن 2 ئاکار، ڕێتاکار ◌ 1 تشریفات، آداب معاشرت، آداب 2 اخلاق

**Eton collar** *noun*
یەخە یان ملیوانی راست (شەق) و پان (گەورە) ◌ یقەی راست و بلند

**Eton jacket** *noun*
جۆری ژاکێت یان کراسی کورتی قۆڵدرێژی بەرئاواڵە (جاران لە لایەن شاگردانی کۆلێژی ئیتۆن لەبەر دەکرا) ◌ ژاکت اتون

**Etonian** /iːˈtəʊnɪən/ *noun, adjective*
*n* شاگردی کۆلێژی Eton (هی کوڕان) *adj* سەربە یان تایبەتی کۆلێژی ئیتۆن ◌ اتونین

**etrier** /ˈeɪtrɪeɪ/ *noun*
(شاخەوانی) جۆری نەردیوانی تەنافی، ناوبەرە یان پلەکانی لە دار یان ئاسن (لە *étrier* فەرەنسی "stirrup") ◌ اتریر

**Etrurian** /ɪˈtrʊərɪən/ = Etruscan

**Etruscan** /ɪˈtrʌsk(ə)n/ *noun, adjective*
*n* خەڵکی Etruria، هەرێمێکی کۆنی ڕۆژاوای ئیتالیا *adj* زمانی ئیترۆریا، بە ئاوێتی وەرگیراو لە یۆنانی‌یەوە دەنووسری 2 سەربە ئیترۆریا، خەڵکەکەی یان زمانەکەیان ◌ اتروریایی

**et seq** *adverb*, Latin *et sequens*/ *sequential*, also et seqq.
و هتد، و دوای ئەوە، و درێژەکەی (بنەڕەت: لە *et sequens* لاتین) ◌ و بعد از آن

**étude** /ˈeɪtjuːd, US -tuːd *noun*
(موسیقا) لێکۆڵینەوە، ئێتود (بنەڕەت: لە فەرەنسی‌یەوە "study") ◌ بررسی

**-ette** *suffix*
پاشگر: 1 چکۆلە، ئاماژە بە ئەندازەیێکی چکۆلە: *kitchenette* ،*novelette* ،*sermonette* 2 مێوینە، مێینە: *suffragette* ،*farmerette* ،*usherette* 3 جێگرەوە، لاسایی: *leatherette* (بنەڕەت: لە *-ette* فەرەنسی کۆن، مێینەی *-et*) ◌ پسوند: 1 کوچک 2 مؤنث 3 جانشین، تقلید

**étude** /ˈeɪtjuːd, US eɪˈtjuːd/ *noun*
1 پارچە موسیقایێکی کورت 2 لێکۆڵینەوە، خوێندنەوە (بنەڕەت: لە فەرەنسەوە بە واتای "study") ◌ 1 قطعەی موسیقی کوتا 2 مطالعه

**etui** /ɛˈtwiː/ *noun*, also etuis
قوتیلە، قوتوی چکۆلە، جێ‌دەرزی، دەرزی‌دان ◌ قوطی کوچک

**-etum** *suffix*
پاشگر: (ناو دەسازێنێ) ئاماژە بە کۆمەڵە دار یان رووەک: *arboretum* (بنەڕەت: لە لاتینەوە) ◌ پسوند: اسم‌ساز

**etymological** /ˌetɪməˈlɒdʒɪkl, US -ˈlɑːdʒ-/ *adjective*
سەربە مێژووناسی وشە، سەربە وشەوانی ◌ ریشه‌شناختی

**etymologically** /ˌetɪməˈlɒdʒɪkli, US -ˈlɑːdʒ-/ *adverb*

لەباری مێژووناسی وشەوە، لەباری وشەوانی‌یەوە ◌ از نظر ریشه‌شناختی

**etymologist** *noun*

مێژووناسی وشە، وشەوان، مێژووناس (وشە) ◌ ریشه‌شناس

**etymology** /ˌetɪˈmɒlədʒi, US -ˈmɑːl-/ *noun, pl.* etymologies

مێژووناسیتی وشە، وشەوانی، مێژووی وشە، ریشەدۆزی، ڕەچەڵەکناسی وشە، بنەڕەتناسی وشە ◌ ریشه‌شناسی

**etymon** /ˈetɪmɒn, US -mɑːn/ *noun, pl.* etymons or etyma

ڕەگی وشە، بنەڕەت یان ریشەی وشە، بنج یان ڕەچەڵەکی وشە، وشە یان مۆرفیمێ کە وشەکانی تر لەوەوە داڕێژراون یان پێکهاتوون ◌ ریشه‌ی واژه

**EU** /ˌiː ˈjuː/ *abbreviation* European Union

یەکێتی ئەورووپا ◌ اتحادیه‌ی اروپا

**eu-** *prefix*

پێشگر: باش، چاک، خاس، جوان، هوو (لە ئینگلیزی کۆنەوە): *eupeptic* (بنەڕەت: لە *eu* یۆنانی‌یەوە "well"، لە *eus* "good") ◌ پیشوند: خوب، نیکو، به، هو

**Eu** symb. the chemical element europium

**eubacteria** /ˌjuːbakˈtɪərɪə/ *noun, pl.*

(زیندەناسی) هووتووليزەکان، یوبەکتریا(کان)، بەکتریا ڕاستەقینەکان: کۆمەڵێکی بەربلاوی بەکتریاکانی تاکخانەیی دیوارە(خانە)ڕەق، بەکتریا ڕاستەقینەکان و cyanobacteria دەگرێتەوە ◌ یوباکتریا(ها)

**eubacterial** *adjective*

سەربە یوبەکتریا(کان) یان بەکتریا ڕاستەقینەکان ◌ وابسته به یوباکتریا(ها)

**eucalypt** = eucalyptus

**eucalyptol** *noun*, also eucalyptole or cineole

شلەیێ $C_{10}H_{18}O$ کە بۆنی camphor دەدا و لە زۆر عەترە ڕۆندا هەیە (وەک eucalyptus) و ب.ت. وەک دەرمانی کۆخە expectorant و لە بواری گوڵاوسازی‌دا بەکاردێتری ◌ یوکالیپتول

**eucalyptus** /ˌjuːkəˈlɪptəs/ *noun*, also eucalypt, *pl.* eucalyptuses or eucalypti /-tʌɪ/

1 (هەروەها eucalyptus tree) داری کافوور یان قەڵەمتۆز، قەڵەمتۆز [تۆخم *Eucalyptus*: گەڵێ جۆرن] 2 ڕۆنی یۆکالیپتیس یان ئۆکالیپتۆس ◌ 1 اوکالیپتوس 2 روغن اوکالیپتوس

**eucaryote** = variant spelling of eukaryote

**Eucharist** /ˈjuːkərɪst/ *noun*

شێوی خواوەندی، شێوی خوایی ◌ عشاء ربانی

**Eucharistic** *adjective*, also Eucharistical

سەربە شێوی خواوەندی ◌ وابسته به عشاء ربانی

**euchre** /ˈjuːkə/ *noun*

جۆرێ کایەی پەڕێن لە ئەمریکا ◌ یوکر

**euclase** *noun*

کانێ کە لە سیلیکاتی ناسکی beryllium و ئالومینیوم پێکهاتووە و ڕەنگی سەوزی کاڵ یان شینی هەیە و ب.ت. لە بواری گەوهەردا بەکاردێتری ◌ یوکلاس، یوکلیز

**Euclidean** /juːˈklɪdɪən/ *adjective*

یوکلیدی‌یەن، یوکلیدی، ئۆقلیدۆسی ◌ اقلیدسی

**Euclidean geometry** /juːˌklɪdiən dʒiˈɒmətri: US - ˈɑːm-/ *noun*

ئەندازەی ئۆقلیدۆسی ◌ هندسه‌ی اقلیدوسی

**Euclidean space** *noun*

شوێنی ئۆقلیدۆسی ◌ مکان اقلیدوسی

**eucromatin** *noun*

ئەو بەشە چالاکەی کرۆماتین کە زۆربەی لە ژێن gene پێکهاتووە ◌ یوکروماتین

**eucromatic** *adjective*

سەربە یوکرۆماتین ◌ وابسته به یوکروماتین

**eucryphia** /juːˈkrɪfɪə/ *noun*

جۆرێ دەوەن یان دارۆچکەیێ، ڕەسەنی ئەوستراليا و ئەمریکای باشووری [*Eucryphia*] ◌ یوکریفیا

**eudaemonism** /juːˈdiːmənɪz(ə)m/ *noun*, also eudemonism

سیستمێکی ئاکاری لەسەر بنچینەی باشی و بەختەوەری ◌ اوداامونیسم

**eudaemonist** /juːˈdiːmənɪst/ *noun*

یودیمێنتالیست ◌ اوداامونیست

**eudaemonistic** *adjective*

یودیمێنتالیستی ◌ اوداامونیستی

**eudiometer** /ˌjuːdɪˈɒmɪtə/ *noun*

گازپێو ◌ اودیومتر

**eudiometric** *adjective*

سەربە گازپێوی ◌ وابسته به اودیومتری

**eudiometry** *noun*

گازپێوی ◌ اودیومتری

**eugenic** *adjective*

1 چاککردنی ڕەگەز، باشکردنی نژاد، چاکسازی ڕەگەزی یان نژادی 2 سەربە باشڕەگەزی ◌ 1 اصلاح نژاد 2 وابسته به بەنژادی

**eugenics** /juːˈdʒenɪks/ *noun, pl.*

1 باشڕەگەزی، چاکسازی یان چاککردنی ڕەگەزی یان نژادی 2 زانستی باش کردنی ڕەگەز ◌ 1 بەنژادی 2 علم اصلاح نژاد

**eugenicist** /juːˈdʒenɪsɪst/ *noun*, also eugenist /juːˈdʒiːnɪst/

باشڕەگەزناس، پسپۆری چاککردنی ڕەگەزی ◌ بەنژادشناس

**eugenol** /ˈjuːdʒɪnɒl/ *noun*

(کیمیا) یوجینۆل، ئۆجینۆل: شلەیێکی

ئارۆماتیکی چەور $C_{10}H_{12}O_2$، لە بواری گولاوسازی و ددانسازیدا وەک ژانشکێنێ بەکاردێتری (لە رۆنی داری مێخەکدا clove هەیە) ◇ اوجینول

**eugeosynclinal** *adjective*

سەربە یوژیۆسینکلین ◇ وابستە بە اوجیوسینکلین

**eugeosyncline** *noun*

ناوچەیێکی دەریایی، نیشتووێکی زۆر ئەستووری هەیە کە ماک و بەرهەمی چالاکی گرکانی لەگەڵ نیشتووە clastic ـەکان تێکەڵاو بوون ◇ اوجیوسینکلین

**euglena** /ju:'gli:nə/ *noun, pl.* euglenas

(زیندەناسی) یوگلینا، ئیوگلینا: زیندەوەرێکی flagellateی ئاوی شیرینی تاکخانەیی، جاروبار تویژالێکی سەوز لە پۆنگاوا پێکدێنێ [توخم *Euglena*] ◇ اوگلین

**euglenoid** *adjective, noun,* also euglenid

*adj* 1 سەربە یان شێوەی euglena کان دەدا، یوگلینئاسا، شێوەیوگلین 2 سەربە ئەو جووڵە و بزاوتە کرمئاسایانە کە تایبەتمەندی یوگلینەکانە *n* زیندەوەر یان ئۆرگانیزمێکی یوگلینی یان یوگلینئاسا ◇ اوگلینوید

**euglenoid movement** *noun*

جووڵانی پرکرژوقرچی شیلاقدارانی یوگلینۆیدی ◇ حرکت اوگلینویدی

**euglobulin** *noun*

پرۆتئینێکی سادە کە لە نێو ئاوی پەتیدا ناتوێتەوە ◇ اوگلوبولین

**euhemerism** *noun*

(جاروبار بە Euhemerism) تیۆرییێ کە پێیوایە خوداکان و ئەفسانە و میتەکان هەر ئەو کەسە قارەمان و پاڵەوانانەی سەرعەرز بوون کە خەڵک پلە و پایەی خوداییتییان بۆ داناون و بەرەبەرە بوونەتە خودا و ئەفسانە (بنەڕەت: لە ناوی Euhemer(us) (دەوروبەری 300 بەرلە زایین)، نووسەری یۆنانی کە پێشەنگی ئەم بیرە بوو) ◇ اوهمریسم

**euhemerist** *noun*

یوهێمێریست ◇ اوهمریست

**euhemeristic** *adjective*

یوهێمێریستی ◇ اوهمریستی

**eukaryote** /ju:'karıəut/ *noun,* also eucaryote

(زیندەناسی) باشناوکە(یی): ئەو گیانەوەرانەی کە خانەکانیان خاوەنی پەردەی ناوک و تایبەتمەندی پێشکەوتووترە و ماکی بۆماوەییيان genetic material لە ژمارە کرۆموزۆمێ پێکهاتوو لە DNA و پرۆتئین دایە؛ ئەو زیندەوەرانەی کە لە یەک یان چەند خانە پێکهاتوون و کۆمەڵە ناوک و ئەندامژەیێکی بەرچاو و دیاریان تیایە (بڕوانە prokaryote) ◇ اوکاریوت

**eukaryotic** *adjective*

سەربە یان پێوەندی باشناوکە(یی یە)وە هەیە ◇ وابستە بە اوکاریوت

**eulachon** /'ju:ləkɒn/ = candlefish

**eulogist** /ju:'dʒi:nıst/ *noun*

پیاهەڵبێژ، پیاهەڵدەر، پەسندەر، ستایشتکار ◇ مداح، ستایش‌گر

**eulogistic** /ˌju:lə'dʒıstık/ *adjective*

پیاهەڵدەرانە، پیاهەڵبێژانە، پەسندەرانە ◇ ستایش‌آمیز

**eulogium** /ju:'ləudʒıəm/ *pl.* eulogia /-dʒıə/ or eulogiums = eulogy

**eulogizer** *noun*

پیاهەڵبێژ، پیاهەڵدەر، پەسندەر، ستایشتکار، ستایشتکەر، ستایشتگەر، پەسنگۆ، پەسنبێژ ◇ ستایش‌گر، مداح

**eulogy** /'ju:lədʒi/ *noun, pl.* eulogies

پیاهەڵدان، پیاهەڵوتن، ستایشت، پەسندان، پەسنگۆیی ◇ مدح، ستایش

**Eumenides** *noun,* Latin, from Greek, literally "the gracious ones"

یومێنیدیز، ئومێنیدیس: Fury یەکانی میتۆلۆژی یۆنانی ◇ اومنیداس

**eunuch** /'ju:nək/ *noun*

خواجە، پیاوی خەساو ◇ خواجەباشی

**eunuchism** *noun*

خواجەیی، خەساوی، ئەختەیی، یەختەیی ◇ خواجگی، اختگی

**euonymus** /ju:'ɒnıməs/ *noun*

خاسناو؟، هوونناو؟، دەوەنێ یان دارۆچکەیێ [توخم *Euonymus*: گەلێ جۆرن] (بنەڕەت: لە یۆنانییەوە: *eus* "باش" + *onoma* "ناو") ◇ یونیموس

**eupepsia** *noun*

ئاسانهەرسی، خۆشهەرسی، هەرسی باش ◇ گوارش خوب

**eupeptic** /ju:'pεptık/ *adjective*

ئاسانهەرس، هەرسی ئاسان یا باش، سووک، خۆشهەرس ◇ سهل‌الهضم

**euphemism** /'ju:fəmızəm/ *noun*

باشدەربڕی(ن)، باشدەربڕە، دەربڕینی جوانتر ◇ حسن تعبیر

**euphemistic** /ˌju:fə'mıstık/ *adjective*

1 باشدەربڕییانە، سەربە باشدەربڕە: 2 *euphemistic language* بەرێزانە، بەڕەوشتانە ◇ 1 وابستە بە حسن تعبیر 2 محترمانە

**euphemistically** /ˌju:fə'mıstıkli/ *adverb*

لە رووی باشدەربڕییەوە، جواندەربڕینانە ◇ با حسن تعبیر

**euphonious** /ju:'fəuniəs, US -'fou-/ *adjective*

دەنگ‌خۆش، خۆش‌ئاواز، بەگوێ‌خۆش ۞ خوش‌آوا

**euphoniously** /juːˈfəʊniəsli, US -ˈfoʊ-/ *adverb*
دەنگ‌خۆشانە، بە دەنگ‌خۆشی‌یەوە ۞ با خوش‌آوایی

**euphonium** /juːˈfəʊniəm, US -ˈfoʊ-/ *noun*
یۆفۆنیۆم (= ئامێرێکی فووپی زەردی گەورەیە، شێوەی tuba یێکی چکۆلە دەدا) ۞ اوی‌فونیوم

**euphony** /ˈjuːfəni/ *noun*, *pl.* euphonies
1 دەنگ‌خۆشی، خۆش‌ئاوازی 2 گۆڕینی فۆنێتیک بۆ بێزان و کۆکردنی ئاسان ۞ 1 خوش‌آوایی، خوش‌آهنگی 2 اوفونی

**euphorbia** /juːˈfɔːbɪə/ *noun*
خوزیلک، خوشیلک، شیرمار، شیرشیرۆکە، شیرخوزیلک، ڕووەکی تیرەیێ کە spurge ـەکان دەگرێتەوە [توخم *Euphorbia*] ۞ نوعی گیاه

**euphoria** /juːˈfɔːrɪə/ *noun*
سەرخۆشی، سەرمەستی، شاگەشکەیی، شادی، دلخۆشی: *Euphoria soon gave way to despair* ۞ شعف، وجد، خرم‌دلی

**euphoric** /juːˈfɒrɪk, US -ˈfɔːr-, -ˈfɑːr-/ *adjective*
سەرخۆشانە، سەرمەستانە، شاگەشکانە (euphorically *adv*) ۞ وجدآمیز

**euphrasia** /juːˈfreɪzɪə/ *noun*
eyebright یان گیایێکی پێوەندی‌دار [توخم *Euphrasia*] ۞ نوعی گیاه

**Euphrates poplar** *noun*
(داری) پەلک ۞ اویفرات پوپلار

**Eur(o)-** /ˈjʊərəʊ, US ˈjʊroʊ/ *prefix*
پێشگر: 1 ئەورووپایی و... 2 سەربە ئەورووپا و یەکێتی ئەورووپا: *a Euro-MP* ۞ پیشوند: 1 اروپایی و... 2 وابسته به اروپا و اتحادەی اروپا

**Eurasian** /jʊˈreɪʒn, US -ˈreɪʃn/ *adjective, noun*
*adj* 1 سەربە ئوروواسیا Eurasia، سەربە ئەورووپا و ئاسیا، ئوراسیایی 2 دوورەگەی ئوراسیایی *n* کەسێکی دورەگەی ئوراسیایی ۞ *adj* 1 وابسته به اوراسیا 2 دورگەی اوراسیایی *n* آدم دورگەی اوراسیایی

**eureka** /jʊˈriːkə/ *interjection, noun*
*interj* دۆزیمەوە، پەیدام کرد، دیتمەوە (وتەکەی Archimedes کاتێ شێوەی تاقی‌کردنەوەی پەتی‌بوونی زێڕی دۆزی‌یەوە)، هەی گیان، ناخ گیان *n* دارشتەی مس و نیکل ۞ *interj* یافتم *n* آلیاژ مس و نیکل

**eurhyth** = eurhythmics

**eurhythmic** /jʊ(ə)ˈrɪðmɪk/ *adjective*
(دەگمەن) هاوریژە، هاوریک، گونجاو ۞ متناسب

**eurhythmics** /juˈrɪðmɪks/ *noun, pl.*, also eurhythmy; US also eurythmics, eurythmy
یۆریسمیکس (سیستمی مەشق و کارکردنی لەش بە جوولە و موزیکەوە)، (هەلپەڕین و سەماکردن بەو شێوازە) ۞ اوریتمیک

**euro** /ˈjʊərəʊ, US ˈjʊroʊ/ *noun, pl.* same or euros
یۆرۆ، یورۆ: یەکەی پارەیێ کە لە زۆربەی ولاتانی یەکێتی ئەورووپادا دەتوانێ بەکاربێتریێ ۞ یورو

**Euro** /ˈjʊərəʊ, ˈjʊroʊ/ *noun*
ئورۆ، ئەورووپایی (ب.ت. یەکێتی ئەورووپا) ۞ اورو

**Eurocheque** *noun*
چەکی ئەورووپایی ۞ چک اروپایی

**Eurocommunism** *noun*
کۆمۆنیزیمی ئەورووپایی ۞ کمونیسم اروپایی

**Eurocommunist** *noun, adjective*
*n* کۆمۆنیستی ئەورووپایی *adj* سەربە کۆمۆنیستی ئەورووپایی ۞ *n* کمونیست اروپایی *adj* وابسته به کمونیست اروپایی

**Eurocrat** /ˈjʊərəkræt, US ˈjʊr-/ *noun*
(سووکانە) یۆرۆکرات، ئەورۆکرات، یورۆکرات (= کەسێ کە لە بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵەی ئابووری ئەورووپادا کار دەکا) ۞ اوروکرات

**Eurodollar** *noun*
دۆلاری ئەورووپایی ۞ دلار اروپایی

**Euroland** /ˈjʊərəʊlænd, US ˈjʊroʊ-/ *noun*
ناوچەی ئابووری ولاتانی ئەندامی یەکێتی ئەورووپا ۞ اورولند

**Euromarket** *noun*
بازاڕی هاوبەشی ئەورووپا، یەکێتی ئەورووپا وەکوو تاکە بازاڕی دارایی و بازرگانی ۞ بازار مشترک اروپا، اورومارکت

**Euro-MP** *noun*
ئەندامی پارلەمانی ئەورووپایی ۞ عضو پارلمان اروپایی

**Europa** *noun*, Latin, from Greek *Eurōpē*
ئەورووپا: شازادەی فینیکیایی Phoenician کە لە لایەن زیۆس Zeus بە شێوەی گایێکی سپی لێ‌دەرهات و دایکی Minos، Rhadamanthus و Sarpedon ـە (لە میتۆلۆژی یۆنانی‌دا) ۞ اروپا

**Europe** /ˈjʊərəp, US ˈjʊrəp/ *noun*
1 وشکاری ئەورووپا 2 فەرەنگ، فەرەنگستان، ئەورووپا (بێجگەلە بریتانیا و ئیرلەند) 3 کۆمەڵەی ئابووری ئەورووپا 4 یەکێتی ئەورووپا ۞ 1 قارەی اروپا 2 اروپا (به جز بریتانیا و ایرلند) 3 جامعەی اقتصادی اروپا 4 اتحادیەی اروپا

**European** /jʊərə'pi:ən, US jʊr-/ *adjective, noun*
*adj* سەربە ئەورووپا، ئەورووپایی، ئەورووپایی، سەربە خەڵکی ئەورووپا *n* خەڵکی ئەورووپا ◌ *adj* وابسته به اروپا، وابسته به مردم اروپا *n* اهل اروپا

**European Economic Community** *noun*
کۆمەڵەی ئابووری ئەورووپا، بازاری هاوبەش ◌ جامعەی اقتصادی اروپا، بازار مشترک

**European Union** *noun*, also European community
یەکێتی ئەورووپا ◌ اتحادیەی اروپا

**europium** /jʊər'əʊpiəm, US jʊr'oʊ-/ *noun*
(کیمیا) یۆرۆپیۆم، ئورۆپیۆم (بە ژ.گ. 63، ن. Eu) ◌ اوروپیم

**Euro-sceptic** *noun, adjective*
کەسێکی دژی زۆربوونی هێز و دەسەڵاتی یەکێتی ئەورووپا ◌ اورواسکپتیک

**Euro-scepticism** *noun*
دژی زۆربوونی هێز و دەسەڵاتی یەکێتی ئەورووپا ◌ اورواسکپتیسیسم

**Eurozone** /'jʊərəʊzəʊn, US 'jʊroʊzoʊn/ = Euroland

**eury-** *prefix*
پێشگر: پان، فراوان، هەراو، بەرین: *eurytopic*، *euryhaline* (لە *eurus* یۆنانییەوە "wide") ◌ پیشوند: عریض، پهن، وسیع، گسترده

**Eurydice** *noun*
یوریدیس، یوریدیکێ: ژنی Orpheus کە ئۆرفیوس حەولی داوە دوای مردنی لە Hades بیگەڕێنێتەوە سەر دنیا ◌ اوریدیس

**euryhaline** /jʊərɪ'heɪlʌɪn, US -'heɪli:n/ *adjective*
(ژینگەناسی) پانەسوێرژی: دەتوانێ لە ئاوی زۆر سوێردا هەڵکا، دەتوانێ لە پانتاییێکی بەربڵاوی سوێریدا بژی ◌ اوریهالین

**euryphagous** *adjective*, also euryphagic
پانخۆر، بەرینخۆر: ئەو گیانەوەر یان ڕووەکانەی کە بە یەک جۆر خۆراکی تایبەتەوە بەند نین ◌ اوریفاگوس

**eurypterid** /jʊ(ə)'rɪptərɪd/ *adjective*
پانباڵینە: جۆرێ گیانەوەری بووبەردی جومگەداری ئاوی زەبەلاحی (یان کەتە) کۆمەڵێ کە لە سەردەمانی Palaeozoic دەژیا و شێوەی جالجالۆکەیێکی زلە دەدا ◌ اوریترید

**eurythermal** /jʊərɪ'θə:m(ə)l/ *adjective*
(ژینگەناسی) پانەگەرمازی: دەتوانێ لە تێمپراچێری زۆردا هەڵکا، دەتوانێ لە پانتاییێکی بەربڵاوی گەرمادا بژی: *eurythermal animals* (بڕوانە stenothermal) ◌ اوریترمال

**eurytopic** *adjective*
(ژینگەناسی) پانەجێژی، پانەجێ، پانەشوێن ◌ اوریتوپیک

**euryzonic** *adjective*
(ژینگەناسی) پانەناوچەژی: تایبەتمەندی ئەو گیانەوەرانەی کە لە بەرزایی جۆراوجۆردا دەژین ◌ اوریتوپیک

**eurythmic or eurythmous** = eurhythmal

**eurythmics** also **eurythmy** = eurhythmics

**Euskara** /'ju:skərə/ *noun*
زمانی باسک ◌ زبان باسک

**Eustachian tube** *noun*
(پزشکی، لوولە یان) جۆگەی ئۆستاکی ◌ شیپور استاش

**eustasy** /'ju:stəsi/ *noun, pl.* eustasies
گۆڕانی ئاستی دەریا لە سەرتاسەری دنیادا ◌ اوستاسی

**eustatic** *adjective*
سەربە گۆڕانی ئاستی دەریا لە سەرتاسەری دنیادا ◌ وابسته به اوستاسی

**eustele** *noun, pl.* eusteles
یوستێل: جۆرێ ڕێکخستنی ئاوخۆری داری xylem و نیان (شانەی ڕیشاڵی phloem) لە ڕیشاڵی (یان تاڵ strand) دابڕاو، لە لایەن شوێنی شانەی parenchymatous ـەوە جیا بۆتەوە، جۆرێ stele تایبەت بە گیا و ڕووەکی dicotyledonous کە لە چەپکێ یان دەستە ئاوخۆرەیێکی ڕیشاڵەکانی xylem و phloem پێکهاتووە کە کۆمەڵێ خانەی parenchymal لە نێوان چەپکەکاندا هەیە ◌ اوستل

**eutectic** /ju:'tɛktɪk/ *adjective, noun*
*adj* (کیمیا) یۆتێکتیک، ئاسانتو(و)او، زووتوواو، خۆشتواو، ئێتێکتیک *n* ماک یان مەتریالی ئاسانتوواو یان ئێتێکتیک (بنەڕەت: لە *eutēktos* یۆنانییەوە "ئاسانتواو "easily melting) ◌ اتکتیک

**eutectic change** *noun*
(کیمیا) گۆڕانی یۆتێکتیک ◌ تغییر اتکتیک

**eutectic point** *noun*
(کیمیا) خاڵی یۆتێکتیک ◌ نقطەی اتکتیکی

**eutectoid** *adjective, noun*
*adj* شێوەی ماکێکی زووتوواو یان ئاسانتوواو دەدا *n* داڕشتەی زووتواو یان ئاسانتوواو ◌ اتکتوید

**Euterpe** *noun*, Latin, from Greek *Euterpē*
یوتێرپێ: Muse ی موسیقا (و هۆنراوەی ئاوازین lyric poetry) لە میتۆلۆژی یۆنانیدا ◌ اوترپه

**Euterpean** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە یوتێرپێیەوە هەیە ◌ وابسته به اوترپه

**euthanasia** /ˌjuːθəˈneɪziə, US -ˈneɪʒə/ *noun,* also mercy killing
هوومەرگی، هووکوژی، باش‌کوژی، ئاسان‌کوژی، بێ‌ژان‌کوژی، مەرگی ئاسان یان بێ‌ژان، کوشتن لە رووی (یان لەبەر) بەزەیی‌یەوە (هی نەخۆش یان گیانەوەرانی ماڵی؛ بنەڕەت: لە یونانی‌یەوە، لە *eu* "باش، هوو" + *thanatos* "مەرگ") ۞ بەکشی، مرگ آسان، قتل ترحمی

**euthanasic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە یوتانزیاوە هەیە، سەربە هوومەرگی ۞ وابستە بە euthansia

**euthanics** *noun, pl.*
زانستێ کە لەمەر پەرەپێدانی خۆش‌گوزەرانی مرۆڤ بە رێگای باش‌کردنی بارودۆخی ژیان دەکۆڵێتەوە، زانستی بەختەوەری و خۆش‌گوزەرانی یان ژین‌فرەهی مرۆڤ ۞ یوتانیکس

**Eutheria** /juːˈθɪərɪə/ *noun, pl.*
(گیانەوەرناسی) پزدان‌داران، باش‌لاوران: کۆمەڵێکی بەربڵاوی گوان‌داران کە placental ـەکان دادەگرێ (بڕوانە Metatheria؛ بنەڕەت: لە -eu + *thēria* یونانی، کۆی *thērion* "wild animal") ۞ یوتریا

**eutherian** *adjective, noun*
*adj* سەربە یان پێوەندی بە کۆمەڵی یوتێریاوە هەیە کە شیردەران یان گوان‌دارانی پزدان‌دار دەگرێتەوە *n* گیانەوەرێکی وا ۞ یوترین

**euthyroid** /juːˈθʌɪrɔɪd/ *adjective*
رژێنەی سایرۆئیدی باش کار دەکا ۞ اوتیروئید

**eutrophic** /juːˈtrəʊfɪk, -ˈtrɒfɪk/ *adjective*
(ژینگەناسی، لەبارەی گۆماوێ) پڕخۆراک، پڕخواردەمەنی: ئەو ئاوانەی کە ماکی خۆراکی یان زۆر تیایە (بڕوانە mesotrophic و oligotrophic) ۞ یوتروفیک

**eutrophication** *noun*
پڕخۆراکاندن، پڕخواردەمەنی‌کردن: مایەداربوونی ئاو بە خواردەمەنی (ماکی خۆراکی) کانی (یان نائەندامی) و ئەندامی کە لە ئاخرسەرا دەبێتە هۆی زۆربوون و پەرەسەندنی گیانەوەرانی ئاوی (لەودا ئاو ئۆکسیژێنیش کەم دەکا) ۞ یوتریفیکاسیون

**eutrophy** *noun*
پڕخۆراکی، پڕخواردەمەنێتی ۞ یوتروفی

**evacuant** /ɪˈvakjʊənt/ *adjective, noun*
*adj* بەتاڵ‌کەرەوە *n* 1 (دەرمانی) رەوانی 2 دەرمانی رشانەوە ۞ *adj* تخلیەکنندە *n* 1 (داروی) مسهل 2 داروی قی

**evacuation** /ɪˌvækjuˈeɪʃn/ *noun*
1 چۆڵ‌کردن، رۆیشتن، بەجێ‌هێشتن، لابردن، تیانەهێشتن، بەتاڵ‌کردن، بردنەدەرەوە، راگوێستن 2 دەردان، دەرکردن 3 (سەربازی) پاشەکشێ 4 پیسایی، گوو ۞ 1 تخلیە، ترک 2 دفع 3 عقب‌نشینی 4 مدفوع

**evacuative** = evacuant

**evacuees** *noun, pl.*
چۆڵ‌کردووان، هەڵاتووان، پەنابەران، لابردراوان، رۆیشتووان، راگوێزراوان (لەبەر لافاو، شەڕ و هتد) ۞ تخلیەشدگان

**evadable** /ɪˈveɪdəbl/ *adjective*
شیاوی لەژێردەرچوون، خۆی لێ گێل دەکرێ، خۆی لێ دەدزرێتەوە ۞ طفرەزدنی

**evadingly** /ɪˈveɪdəbli/ *adverb*
بە خۆلێ‌دزینەوە، بە خۆ گێل‌کردنەوە ۞ طفرەزنان، تجاهل کنان

**evangination** *noun*
(زیندەناسی) لەنێوەوە هەڵگێرانەوە ۞ ازتوبرگردانی

**evaluation** /ɪˌvæljuˈeɪʃn/ *noun*
1 نرخاندن، هەڵسەنگاندن، لێکدانەوە، قەبلاندن، مەزندەکردن 2 نرخ‌دانان، بایەخ‌دانان ۞ 1 ارزیابی، برآورد، سنجش 2 ارزش‌گذاری

**evaluator** *noun*
نرخێنەر، هەڵسەنگێنەر، قەبڵێنەر ۞ ارزیاب، برآوردکنندە

**evanescence** /ˌiːvəˈnesns, US: usually ˌev-/ *noun*
مردن، مەرگ، تیاچوون، لەنێوچوون، کوێربوونەوە، نەمان، لەبیرنەمان، لاچوون، سڕانەوە، زووبەسەرچوون، زووڕۆیی، نابەردەوامی (بەرەبەرە) ۞ مرگ، ناپایداری، محو تدریجی

**evanescent** /ˌiːvəˈnesnt, US: usually ˌev-/ *adjective*
نامێنی، تیادەچێ، دەمرێ، میرا، کورت‌ماوە، تێژپەڕ، نابەردەوام، زووڕەو، کوێرەوەبوو، زووبەسەرچوو، لەنێوچوو، کەم‌کەم‌تیاچوو، کەم‌کەم نامێنێ، بەرەبەرەلاچوو ۞ نابودشدنی، ناپایدار، زودگذر

**evangel** /ɪˈvan(d)ʒɛl, US -(d)ʒ(ə)l/ *adjective*
1 هەریەک لە چوار Gospel 2 مژدە، مزگێنی، هەواڵی خۆش 3 (لە ئەمریکا) = evangelist ۞ 1 اوانجل 2 مژدە

**evangelical** /ˌiːvænˈdʒelɪkl/ *adjective, noun,* also evangelic
*adj* 1 ئینجیلی، بەپێی ئامۆژگاری ئینجیل 2 پرۆتستانی *n* ئەندامی کۆمەڵی پرۆتستانی ۞ *adj* 1 انجیلی 2 پروتستانی *n* عضو گروە پروتستانی

**evangelicalism** *noun*
باوەڕ و ئامۆژگاری پرۆتستانی ئینجیلی ۞ اوانجلیکالیزم

**evangelism** /ɪˈvændʒəlɪzəm/ *noun*
راگەیاندنی کریستانیەت ۞ تبلیغ مسیحیت

**evangelist** /ɪˈvændʒəlɪst/ *noun*

1 راگەیێنەری کریستانیەت 2 لایەنگری توند یان بەپەرۆشی شتێ ◌ 1 مبلغ مسیحیت، اوانجلیست 2 طرفدار دوآتشه

**Evangelist** /ɪˈvændʒəlɪst/ *noun*

ئینجیلنووس (یەکێ لە چوار نووسەر (مەتا Mattehw، مارک یان مارکۆس Mark، لوکا Luke و جان یان یوحەننا John) ی ئینجیل لە کتێبی پیرۆز دا) ◌ اونجلیست

**evangelization** *noun*

راگەیاندنی کریستانیەت ◌ تبلیغ مسیحیت

**evangelizer** *noun*

راگەیێنەری کریستانیەت ◌ مبلغ مسیحیت

**evaporable** /ɪˈvæpərəbl/ *adjective*

لەهەڵماندنهاتوو، دەهەڵمێنرێ، دەهەڵمێ ◌ قابل تبخیر

**evaporated milk** *noun*

شیری خەست(ەوەکراو) ◌ شیر غلیظ

**evaporation** /ɪˌvæpəˈreɪʃn/ *noun*

هەڵماندن، هوڵماندن، هەڵمین ◌ تبخیر

**evaporative** /ɪˈvæpəreɪtɪv/ *adjective*

سەربە یان پێوەندی بە هەڵماندنەوە هەیە ◌ تبخیری

**evaporator** *noun*

هەڵمێنەر، هەڵمێنە ◌ تبخیرکننده

**evaporimeter** *noun*

هەڵمپێو ◌ تبخیرسنج

**evaporite** /ɪˈvapərʌɪt/ *noun*

(زەویناسی) بەردەهەڵم؟، ئیڤاپۆریت، ئیڤاپۆریت: خوێی سروشتی یان نیشتوویێکی کانی کە پاش هەڵمینی (بەیەکەرەییەکی) ئاو ماوەتەوە، بەردیکی نیشتوو (وەک gypsum) کە بەهۆی هەڵمینی ئاوی دەریا لە گۆلاویکی داخراوەوە پەیدا بووە ◌ اواپوریت

**evaporitic** *adjective*

سەربە یان پێوەندی بە ئیڤاپۆریتەوە هەیە ◌ وابسته به اواپوریت

**evaportranspiration** /ɪˌvapəʊtranspɪˈreɪʃ(ə)n/ *noun*

هەڵمین و ئارەقکردن: کەمبوونەوەی ئاوی سەرعەرز بەهۆی هەڵمینی راستەوخۆ و هەڵمینی گیاکان؛ رەوتێ کە لەودا ئاوی سەرعەرز بەهۆی هەڵمینەوە لە خاک یان ئاستەکانی تر و یا ئارەقکردنی رووەک و گیاکان رادەگوێزرێ بۆ کەش، ئەو برە ئاوە فەوتاوە ناوچەیێ بە ریگای هەڵمینەوە (بە ریگای خاک و ئارەقکردنی گیاکانەوە) ◌ تبخیر و تعرق

**evasion** /ɪˈveɪʒn/ *noun*

1 دەرچوون، هەڵاتن، لەژێرکاردەرچوون، خۆدزینەوە، خۆلێلادان، خۆلێبواردن 2 پێچوپەنا، بە کنگاختن، پرینگانەوە، هەوالە بە گەوالە، خۆگێلکردن 3 بەهانە، پەلپ ◌ 1 گریز 2 طفره، تجاهل 3 عذر

**evasive** /ɪˈveɪsɪv/ *adjective*

1 خۆدزینەوانە، بەخۆدزینەوە، بەخۆگێلکردنەوە 2 بەپێچوپەنا، تەماوی، لێڵ: *evasive answers/comments* ◌ 1 طفره‌آمیز، تجاهل‌آمیز 2 گنگ، دوپهلو

**evasively** /ɪˈveɪsɪvli/ *adverb*

بە خۆگێلکردنەوە، بە خۆدزینەوە ◌ طفره‌زنان

**evasiveness** /ɪˈveɪsɪvnəs/ *noun*

خۆدزینەوە، خۆلێلادان، خۆلێبواردن، پرینگانەوە، پەرێزەکردن، هەوالە بە گەوالە: *Politicians are often accused of -asiveness* ◌ طفره

**eve** /iːv/ *noun*

شەو(ی...)، درەنگان، شێوان، ئێوارە: *one midsummer's eve* ◌ شب، شبانگاه

**Eve** /iːv/ *noun*, Old English *Ēfe*, from Late Latin *Eva*, from Hebrew *Hawwāh*

حەوا، حەووا (یەکەم ژن، ژنی ئادەم و دایکی هابیل و قابیل) ◌ حوا

**Even** /eɪˈvɛn/ *noun*, *pl.* same

1 ئەندامی گەلێکی رەسەن کە لە کۆمەڵەدورگەی Kamchatka ی رۆژهەڵاتی سیبیریا دەژین 2 زمانی Tungusic ی ئەو گەلە ◌ ایون

**even** /ˈiːvn/ *adjective, adverb*

1 *adj* تەخت، راست، گۆڕ، ریک، تەراز، هاوئاست، یەکدەست، یەکئەندازە، بەرامبەر، بەقەدیەک: *his disposition* ◊ *even ground* 2 بێلایەنانە، لانەگرانە 3 جووت (ژمارە) 4 ئارام، لەسەرەخۆ (رەوشت) *was even* *adv* تەنانەت، خۆ ئەگەر ◌ *adj* 1 صاف، هموار، منظم، یکنواخت، یکدست، مساوی 2 منصفانه 3 زوج (عدد) 4 آرام *adv* حتی

**even** = evening

**even as** *conjunction*

هەرکە ◌ به محض اینکه

**even chances** = evens

**even-handed** /ˌiːvnˈhændɪd/ *adjective*

دەسریک، بەداد، بەئینساف، خوادایی، دادپەروەرانە، لانەگر، بێلایەن ◌ منصف، منصفانه، بی‌طرف

**even-handedness** *noun*

دەسرێکی، بەدادی، بەئینسافی، بێلایەنی، لانەگری ◌ انصاف، بی‌طرفی

**even if** = even thought

**evening** /ˈiːvnɪŋ/ *noun, adverb*

1 *n* شەو، درەنگان، شێوان، تاریکان، ئێوارە، ڤێرەگا، پاشنیوەڕۆ 2 ئاخروئۆخر، دوایییەکان (ب.ت. ژیان) *adv* (evenings، نافەرمی) لە شێواندا، هەر شەو ◌ *n* 1 شب، عصر 2 اواخر *adv* در غروب، هر شب

**evening class** *noun*

پیرخانه، خانەی پیران ◌ خانەی افراد مسن

**eventless** *adjective*

بێ‌ڕووداو، بێ‌بوویەر، بێ‌قەومین ◌ بدون حادثه

**eventual** /ɪ'ventʃuəl/ *adjective*

1 دواتر، پاش‌تر، پاشەجار، پاشین 2 دووماهی، کۆتایی، دوایی: *the eventual winner of the tournament* ◊ *The village school may face eventual closure* ◌ 1 بعدی 2 نهایی

**eventuality** /ɪˌventʃu'æləti/ *noun, pl.* eventualities

1 ڕووداو، پێشهات، بوویەر 2 ڕێ‌تێچوون، شیان، ئەگەر: *We were prepared for every eventuality* ◌ 1 حادثه، سانحه 2 احتمال

**eventually** /ɪ'ventʃuəli/ *adverb*

پاشەجار، ئاخر(ی)، ئاقیبەت، سەرەنجام، ئاخرسەر، لە کۆتاییدا، ئاخری و ئۆخری: *Our flight -tually left five hours late* ◌ بالأخره

**eventuation** *noun*

بوونەهۆی، لێکەوتنەوە، بوونە ئەنجام ◌ منتج شدن

**ever** /'evə(r)/ *adverb*

1 هیچ‌کات، هیچ وەختێ، هەرگیز، قەت، حەیاکونها، تا ئێستا، تاکوو ئێستا 2 هەمیشە، بە بەردەوامی 3 ڕۆژێ، کاتێ، وەختێ، سەردەمانێ ◌ 1 هیچ‌گاه، هرگز، اصلاتاکنون 2 همواره 3 روزی، وقتی

**everglade** /'evəgleɪd/ *noun*

زەل، زەلکاو، زۆنگاو، چاموور، تالاو ◌ باتلاق، تالاب

**evergreen** /'evəgri:n, US 'evərg-/ *adjective, noun*

1 *adj* هەمیشەسەوز، سەوزەوون، هەمیشەبەهار، بێ‌پاییز (زۆرتر لە بەرامبەری deciduous) 2 درێژخایەن، درێژماوە، بەردەوام *n* ڕووەکی هەمیشەسەوز یا سەوزەوون ◌ *adj* 1 همیشه سبز 2 بادوام *n* گیاه همیشه‌سبز

**evergreen oak** = holm-oak

**everlasting** /ˌevə'lɑ:stɪŋ, US ˌevər'læstɪŋ/ *adjective*

1 هەمیشەیی، هەتاهەتایی، تاسەر، نەمر(ی)، بێ‌کۆتایی، دوایی‌پێ‌نەهاتوو: *everlasting life/love* 2 بەرگەگر، قایم 3 دوورودرێژ 4 لەسەریەک، بەردەوام، یەکبینە ◌ 1 ابدی، جاودانی 2 بادوام 3 طولانی 4 بی‌وقفه

**the Everlasting** *noun*

خوا(ی نەمر) ◌ خداوند

**everlasting life** *noun*

ژیانی نەمرانە یان نەمری ◌ زندگی جاودانی

**everlastingly** /ˌevə'lɑ:stɪŋli, US ˌevər'læstɪŋ:i/ *adverb*

هەمیشە، یەکبینە، بێ‌پسانەوە، لەسەریەک ◌

پۆلی شەوانە، پۆلی شێوان یان ئێواران ◌ کلاس شبانه

**evening dress** *noun*

بەرگی فەرمی، بەرگی شەوانە (درێژی ژنان): *Everyone was in evening dress* ◌ لباس رسمی، لباس رسمی زنانه

**evening paper** *noun*

ڕۆژنامەی ئێواران، ڕۆژنامەی ئێوارە ◌ روزنامه‌ی عصر

**evening prayer** = evensong

**evening primrose** *noun*

(ڕووەکناسی) ترەوەدیمی، توورەدیمی، توورەکێوی، گیائێواری (ئێواران گوڵ دەکا یا دەکرێتەوە [توخم *Oenothera*: گەلێ جۆرن]) ◌ علف خر

**evening star** *noun*

زاوە، ڤینۆس، مێرکوری، ئەستێرەی شێوان ◌ ناهید، زهره

**Evenki** /eɪ'venki/ *noun, pl.* same or Evenkis

1 ئەندامی گەلێکی ڕەسەنی indigenous people سیبیریای باکووری 2 زمانی Tungusicی ئەو گەلە ◌ اونکی

**evenly** /'i:vnli/ *adverb*

1 بە شێوەیەکی بەرامبەر، بەرامبەرانە: *evenly distributed/divided* 2 دەس‌ڕێکانە، دادپەروەرانە ◌ 1 به طور مساوی 2 منصفانه

**evens** *noun,* also even money or even odds

نیوانیو، ئەگەری 50ـ50، دەرفەتێکی بەرامبەر ◌ احتمال پنجاه درصد

**evensong** /'i:vnsɒŋ, US -sɔ:ŋ/ *noun*

نوێژی شێوان، ڕێ‌ورەسمی دوعا و نزای شێوان (کلێسەی ئەنگلیکان) ◌ نماز مغرب، مراسم دعای مغرب

**event** /ɪ'vent/ *noun*

1 ڕووداو، بوویەر، بەسەرهات، سەرهات، سەربورد، قەوماو، قەومین، پێشهات، ڕوودان 2 ئاکام، ئەنجام 3 پێشبڕکێ ◌ 1 رویداد، سرگذشت، حادثه، وقوع 2 نتیجه 3 مسابقه

**even-tempered** *adjective*

ئارام، هێدی، لەسەرەخۆ ◌ آرام

**eventful** /ɪ'ventfl/ *adjective*

پڕڕووداو، پڕ(لە)سەربردە، زۆرڕووداو، گرنگ ◌ پرحادثه، مهم

**even though** *conjunction*

1 تەنانەت (ئەگەر) 2 سەرەڕای ئەوەش، بێجگەلە ئەوەش، گەرچی ◌ 1 حتی اگر 2 به رغم این‌که

**eventide** /'i:vntaɪd/ *noun*

(وێژەیی) شێوان، درەنگان، تاریکان، چراکەران ◌ شامگاهان

**eventide home** *noun*

همواره، دائم

**evermore** /ˌevəˈmɔː(r), US ˌevərˈm-/ *adverb*
(کۆن، ویژەیی) هەتاهەتا، تاسەر، بۆ هەمیشە، always ،forever ۞ تا ابد

**eversible** *adjective*
شیاوی هەڵگێڕانەوە، سەروین دەکرێ ۞ قابل برگرداندن

**eversion** /ɪˈvɜːʃən, US -ʒən/ *noun*
هەڵگێڕانەوە، سەروین کردن ۞ برگرداندن

**every** /ˈevri/ *adjective*
1 هەمووی، گشتی، تێکڕای، تەواوی، complete، 2 هەر، هەریەک لە 3 ناوەناوە، جارجار entire ۞ 1 همەی 2 هر، هر یک از 3 گهگاه

**everybody** /ˈevribɒdi, US -bɑːdi, -bʌdi/ *pronoun*, also everyone
هەرکەس، هەرکەسێ، هەموو، هەمووکەسێ ۞ هرشخص، هرکسی، همه

**everyday** /ˈevrideɪ/ *adjective*
1 هەر ڕۆژ، هەموو ڕۆژێ، گ ڕۆژێ 2 ڕۆژانە، ئاسایی، عەدەتی: *everyday clothes* ۞ 1 هر روز، همه روز 2 روزمره، عادی

**Everyman** /ˈevrimæn/ *noun*
مرۆی ئاسایی، بنیادەمی ڕەمەکی ۞ آدم معمولی

**everyone** /ˈevriwʌn/ *pronoun*, also everybody
هەرکەس، هەرکەسێ، هەموو، گشت، هەمووکەسێ، everybody: *Everyone has a chance to win* ۞ هرشخص، هرکسی، همه

**everyplace** /ˈevripleɪs/ = everywhere

**everything** /ˈevriθɪŋ/ *pronoun*
هەموو شتێ، هەر شتێ، گرنگترین شت: *When we confronted him, he denied everything* ۞ همەچیز، هرچیزی، مهم‌ترین چیز

**every time** *adverb*
هەمیشە، هەموو وەختێ، هەرکات، هەر کاتێ ۞ همواره، هر وقت

**everywhere** /ˈevriweə(r), US -wer/ *adverb*
هەموو جێگەیێ، گشت جێیێ، هەرشوێنێ، هەر جێیێ: *He follows me everywhere* ۞ همه‌جا، هرجایی

**every which way** *adverb*
لە زۆر لاوە، لەم‌بەر و لەوبەر، بۆ هەر لایێ ۞ به هر سو

**eviction** /ɪˈvɪkʃn/ *noun*
1 دەرکردن، دەرپەڕاندن، پێ‌چۆڵ‌کردن، وەدەرنان، خستنەدەرەوە، چۆڵ‌کردن، بەجێ‌هێشتن: *to face eviction from your home* 2 سەندنەوە، گێڕانەوە، وەرگرتنەوە 3 بابەتی پێ‌چۆڵ‌کراو (evictor *n*) ۞ 1 اخراج، خلع ید 2 استرداد 3 اویکسیون

**eviction order** *noun*
دەستووری دەرکردن یان پێ‌چۆڵ‌کردن ۞ حکم تخلیه

**evidence** /ˈevɪdəns/ *noun*
1 بەڵگە، سەلمێنە، شایەت، گەواهی، ستۆف، شایەتی، شایەدی، گەواهی، testimony: *We found further scientific evidence for this theory* 2 نیشانە، شوێنەوار ۞ 1 مدرک، دلیل، شاهد، گواه، شهادت 2 اثر

**evident** /ˈevɪdənt/ *adjective*
ڕوون، ئاشکرا، دیار، پەیدا، خۆیا، بەرچاو، obvious ،distinct ،patent ،manifest ،clear ،plain ،apparent ۞ واضح، روشن

**evidential** /ˌevɪˈdenʃ(ə)l/ *adjective*
بەڵگەیی، بەڵگەنامەیی، بەڵگەمەند: *The necessary evidential basis for her claim is lacking* ۞ مستند، مستدل

**evidentially** *adverb*
بەڵگەمەندانە، بە شێوەیەکی بەڵگەنامەیی ۞ به طور مستدل

**evidentiary** /ˌevɪˈdenʃ(ə)ri/ = evidential

**evidently** /ˈevɪdəntli/ *adverb*
وادیارە، بە ڕوونی، بە ئاشکرایی ۞ ظاهراً، به وضوح

**evil** /ˈiːvl, US ˈiːvɪl *adjective, noun*
*adj* 1 شەیتانی، پیس، ناجسن، بەدڕەسەن، دژ، خراپ، خوێڕی 2 (یەکجار) ناخۆش (بۆن): *an evil smell* 3 ناشیرین، ناحەز، خراپ، بەوەی، بەزیان، موزیر 4 بێ‌ودم، نگریس، بەدشوم، بێ‌فەڕ *n* 1 خراپی، دژی، شتە خراپەکان، پیسی، بەدڕەسەنی، خراپ 2 بەڵا، نەهامەتی، مەینەتی، کارەسات 3 زیان، زەڕ، زەرەر، وەی 4 دەرد، نەخۆشی ۞ *adj* 1 شیطانی، شرور، پست 2 بد 3 زشت، مضر 4 منحوس، بدیمن *n* 1 بدی، چیزهای بد، شرارت 2 بلا، مصیبت 3 مضرت 4 بیماری

**evildoer** /ˈiːvəlduːə(r)/ *noun*
کەسێکی خراپ، خراپ‌کار، بەدکار، بەدکردار، خراپ، بەدکردەوە، کەج‌کردەوە ۞ آدم شرور، بدکار

**evildoing** *noun*
خراپکاری، بەدکاری، پیسی، خراپی ۞ بدکاری، شرارت

**the evil eye** *noun*
چاوی پیس، چاوپیسی، چاوێنی، بەدچاوی، چاڤینۆکی: *symbols to ward off the evil eye* ۞ چشم شور

**evilly** /ˈiːvəli/ *adverb*
بە خراپەوە، بەدکارانە، بە شێوەیەکی خراپ ۞ با شرارت، به طور بد

**evil-minded** /ˌiːvlˈmaɪndɪd/ *adjective*

پیس، گلاو، بەدبیر، خراپ، ناپاک، بیرچەوت ◌ کثیف، پلیداندیش

**evilness** *noun*

خراپی، بەدی، پیسی ◌ شرارت

**evils** *noun, pl.*

شتە خراپەکان، شتە بەزیانەکان ◌ مفاسد

**evil-smelling** *adjective*

بۆگەن، بۆسار ◌ بدبو

**evincible** /ɪˈvɪnsəbl/ *adjective*

شیاوی دەربرین، لەدەربرینهاتوو ◌ قابل ابراز

**evisceration** /ɪˌvɪsərˈeɪʃn/ *noun*

هەناودەرکێشان، هەناوهەڵکێشان، لابردن یان هەڵکێشانی ئەندامانی نێولەش، بەتاڵکردنی ناوزگ ◌ اندرونەبرداری

**evitable** /ˈevətəbl/ = avoidable

**eviternity** /ˌi:vɪˈtə:nɪti/ *noun*

(کۆن) بوونی تاسەر یان هەتاهەتایی ◌ وجود ابدی

**evocation** /ˌi:vəʊˈkeɪʃn, US ˌi:voʊ-/ *noun*

1 (بە)بیرخستنەوە، بەیادهێنانەوە، وەبیرهێنانەوە 2 ورووژێنەری، بزوێنەری 3 بانگکردن ◌ 1 تجدید خاطرە 2 انگیزندگی 3 احضار

**evocative** /ɪˈvɒkətɪv, ɪˈvɑ:k-/ *adjective*

1 بیرخەرەوە، بەبیرهێنەرەوە، زیندووکەرەوە: *evocative smells/sounds/music* 2 بانگکار 3 ورووژێنەر، بزوێنەر (evocatively *adv*) ◌ 1 یادآور 2 احضارکنندە 3 انگیزان

**evocativeness** *noun*

بیرخەرەوەیی، بەبیرهێنەرەوەیی، زیندووکەرەوەیی ◌ یادآوری

**evolute** /ˈi:vəl(j)u:t, US ˈɛv-/ *adjective*

(رووەکناسی و گیانەوەرناسی) لوول (بوو بۆ دەرەوە و لە لێوارەوە)، پشتەوەلوول، پشتەوەهەڵگەڕاو ◌ برگشتە بە عقب

**evolution** /ˌi:vəˈlu:ʃn, US ˌev-/ *noun*

1 گەشە(سەندن)، پەرەسەندنی بەرەبەرەیی، گووران 2 گۆڕانکاری، گۆڕان، گۆڕانی شێوە، هەڵدان، رسکان، پێشقەچوون، پێشوەچوون، پێشکەوتن 3 (بیرکاری) دەرهێنانی رەگ، رەگدەرکێشی، رەگدۆزی 4 (سەما یان مانۆڕ) بادان، سووڕان، سوور، خول، کار، جوولان، کردار ◌ 1 تکامل 2 تحول، رشد، ترقی 3 استخراج جذر 4 چرخش، حرکت، چرخ، عملیات

**evolutional** /ˌi:vəˈlu:ʃənl/ *adjective*

گۆڕانکارییانە، سەربە پەرەسەندنی بەرەبەرە، پەرەسێنەرانە، گەشەسێنەرانە ◌ تحولی، تکاملی

**evolutional crisis** *noun*

قەیرانی گەشەسێنەرانە یان پەرەسێنەرانە ◌ بحران تکاملی

**evolutionally** *adverb*

بە شێوەیەکی گەشەسێنەرانە یان پەرەسێنەرانە ◌ به طور تکاملی

**evolutionary** /ˌi:vəˈlu:ʃənri, ˌev-, US -neri/ *adjective*

گەشەسێنەرانە، گۆڕانکارییانە، سەربە پەرەسەندنی بەرەبەرە، پەرەسێنەرانە: *evolutionary* ◊ *evolutionary theory change* ◌ تکاملی

**evolutionism** /ˌi:vəˈlu:ʃnɪzəm, US ˌev-/ *noun*

گەشەسەندنگەری، گەشەسەندنباوەری، گۆڕانخوازی، پەرە(سەندن)گەری ◌ تکاملگرایی، تطورگرایی

**evolutionist** /ˌi:vəˈlu:ʃnɪst, US ˌev-/ *noun*

گەشەسەندنباوەر، لایەنگری پەرە(سەندن)گەری ◌ طرفدار تکاملگرایی

**evolvement** *noun*

پەرەسەندن، گەشەسەندن، گۆڕانی بەرەبەرە ◌ تکامل، تغییر تدریجی

**evulsion** /ɪˈvʌlʃən/ *noun*

دەرکێشان، دەرهێنان، هەڵکێشان، هەڵکەندن، هەڵتەکاندن، لەرەگەوەدەرهێنان، لەبندەرکێشان، extraction ◌ استخراج، قلعوقمع

**evzone** /ˈɛvzəʊn/ *noun*

ئێڤزۆن: ئەندامی یەکەی پیادەی infantry هەڵبژاردەی یۆنانی کە زۆرتر وەک پاسەوانی کۆشک خزمەتی دەکرد (بنەڕەت: لە -eu "خاس، جوان" + *zōnē* "پشتێنە، کەمەر، کەمەربەند") ◌ اوزون

**Ewe** /ˈeɪweɪ/ *noun, pl.* same

1 ئەندامی گەلێکی رۆژاوای ئەفریکا لە گانا، تۆگۆ و بێنین 2 زمانی Kwaی ئەو گەلە ◌ ایوی

**ewe** /ju:/ *noun*

مەڕ، مێیە مەڕ، بەز، داشت (بنەڕەت: *eowu* ئینگلیسی کۆن، ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ میش

**ewe neck** *noun*

ملی باریک و کز ◌ گردن شمشیری

**ewe-necked** *adjective*

ملباریک و کز ◌ گردنشمشیری

**ewer** /ˈju:ə(r)/ *noun*

گۆزەلە، تۆنگ، پارچ (بنەڕەت: لەسەر بنچینەی *aquarius* لاتین "ئاوی") ◌ مشربه

**Ewing's sarcoma** *noun*

جۆرێ لووی مەترسیداری ئێسکی ب.ت. هی ئێسکێکی درێژ یان سێبەندە (بنەڕەت: لە ناوی نەخۆشیناسی ئەمریکایی James Ewing) ◌ سارکومای اوینگ یا بواینگز

**ex**[1] /eks/ *noun, pl.* exes

1 کۆنەهاوسەر، هاوسەری پێشوو، کۆنەژن، کۆنەمێرد 2 کۆنەدۆست، دۆستی جاران ◌ 1 همسر سابق 2 دوستدختر یا دوستپسر سابق

**ex**[2] /eks/ *preposition*

1 له 2 بێ، بەبێ: *The price is £1500 ex VAT* ◌ 1 در 2 بدون

**ex**[3] /eks/ *preposition*
خەرجی بردنی تێناچێ ◌ بدون هزینەی حمل

**ex-**[1] /eks/ (also e-; ef- before f) *prefix*
پێشگر: 1 دەرەوە، لە دەرەوە، بۆ دەرەوە، لە دەرەوەی، لە: *ex-ship exclude exclude* 2 بەرە سەرێ، رووڵەسەرێ، بۆ سەرێ: *extol* 3 بە تەواوەتی، تەواو، بە تەواوی، بە شێوەیێکی تەواو: *excruciate* 4 ئاماژە بە لابردن یان دەرکردن: *excommunicate* 5 بەبێ، بێ، نە، بێبەری لە، بێبەش لە: *exsanguineous ex-drawing* (بێ‌خوێن) 6 ئەوبەر، بەدەر لە، بەولاوە، لە دەرەوەی، سەرتر لە: *exceed* 7 ئاماژە بە دۆخێکی پێشووتر، پێشوو، هی پێشوو، جاران، کۆنە، قەدیم: *ex-president ex-husband* (بنەڕەت: لە *ex* لاتین "لە دەرەوەی") ◌ پیشوند: 1 خارج از، بیرون از، از خارج، له 2 به سوی بالا 3 کاملاً، به طور کامل 4 اشاره به عزل 5 بدون، محروم از 6 ماوراء، خارج از، برتر از 7 سابق، قبلی، پیشین، گذشته، اسبق

**ex-**[2] /eks/ (also e-; ef- before f) *prefix*
پێشگر: دەرەوە، بۆ دەرەوە: *exodus* (بنەڕەت: لە *ex* یونانییەوە "بۆ دەرەوە، لە دەرەوە") ◌ پیشوند: بیرون، خارج

**exa-** *prefix*
پێشگر: ئاماژەیە بە فاکتۆری $10^{18}$: *exajoule* ◌ پیشوند: اکسا

**exacerbation** /ɪɡˌzæsəˈbeɪʃn/ *noun*
1 شێرزە(تر)بوون، خراپ‌تربوون، لێ‌پیس‌کردن، توندتربوون، سەختی، توندی 2 تووڕەیی، رق، نارەحەتی ◌ 1 وخامت، شدت 2 خشم

**exact** /ɪɡˈzækt/ *adjective*
ورد، راست، بەسەرنج، تەواو، دروست، وەکوو ئەو، وەکیەک، لێکچوو: *an exact copy/replica of the painting* ◌ دقیق، صحیح، همسان

**exacting** /ɪɡˈzæktɪŋ/ *adjective*
1 سەخت، پڕزەحمەت، پڕئەرک، گران، دژوار 2 ورد، بەسەرنج، سەختگر، توندگر ◌ 1 طاقت‌فرسا، سخت 2 دقیق، سخت‌گیر

**exactingly** /ɪɡˈzæktɪŋli/ *adverb*
بە وردی، ورد، بە سەرنجەوە ◌ با دقت

**exaction** /ɪɡˈzækʃn/ *noun*
1 داواکاری، داخوازی 2 داسەپاندن، (بە زۆر) لێ‌وەرگرتن، زەوت‌کردن، لێ‌ساندن، زۆرسێتنی 3 پوول و پارەی زۆری، باج 4 پڕکاری، گرفتاری ◌ 1 مطالبه 2 تحمیل، اجحاف 3 باج 4 مشغله

**exactitude** /ɪɡˈzæktɪtjuːd, US -tuːd/ *noun*
وردی، وردبوونەوە، دروستی، تەواوی، راستی ◌ دقت، صحت

**exactly** /ɪɡˈzæktli/ *adverb*
دروست، هەر، تەواو، بە سەرنجەوە، بە وردی، بە دروستی، وایە! هەروایە!: *I know exactly how she felt* ◌ دقیقاً، عیناً، همین طور است!

**exactness** /ɪɡˈzæktnəs/ *noun*
وردی، وردبوونەوە، دروستی، راستی ◌ دقت، صحت

**exaggerated** /ɪɡˈzædʒəreɪtɪd/ *adjective*
1 پێوەنراو، زێدەڕۆیانە، هاڕوگێفە، لافانە: *to make greatly/grossly/wildly exaggerated claims* 2 لە رادەبەدەر، لە ئەندازەبەدەر ◌ 1 مبالغه‌آمیز 2 بیش از حد

**exaggeratedly** /ɪɡˈzædʒəreɪtɪdli/ *adverb*
لە رادەبەدەرانە ◌ به طور افراطی

**exaggeration** /ɪɡˌzædʒəˈreɪʃn/ *noun*
پێوەنان، زێدەبێژی، ئەندازەبەدەری، زێدەڕەوی، پەرگیری، زێدەگافی، لاف، لافاندن: *a slight/gross/wild -tion* ◌ مبالغه، اغراق، افراط

**exaggerative** /ɪɡˈzædʒəreɪtɪv/ *adjective*
زۆرپێوەنراو، زێدەبێژانە، لافبێژانە ◌ اغراق‌آمیز

**exaggerator** /ɪɡˈzædʒəˈreɪtə(r)/ *noun*
(زۆر)پێوەنەر، زێدەبێژ، لافبێژ ◌ مبالغه‌کننده

**exaltation** /ˌeɡzɔːlˈteɪʃn/ *noun*
1 شاگەشکەیی، شادی، خۆشی زۆر، سەرخۆشی، سەرمەستی 2 سەربەرزی، سەربڵیندی، سەرفرازی 3 پەسن‌دان، پیاهەڵدان، ستایشت 4 (پایە)بەرزکردنەوە، هەڵکشاندن، بردنەسەرەوە ◌ 1 شعف، شادمانی، شوق 2 ستایش 3 سرافرازی 4 تعالی‌بخشی، ترفیع

**exalté** *noun, adjective*
*n* کەسێکی سەرخۆش یان خۆشحاڵ *adj* هاندەر، هیواپێدەر، دڵگەرم‌کەر، وروژێنەر ◌ *n* آدم خوشحال *adj* مشوق، مهیج

**exalted** /ɪɡˈzɔːltɪd/ *adjective*
1 (بە شۆخی یان فەرمی) بەرز، بڵیند، لەسەرێ، پایەبەرز، سەرفراز، سەربەرز: *You're moving in very -ed circles!* 2 سەرخۆش، سەرمەست، شاگەشکە: *I felt exalted and newly alive* ◌ 1 رفیع، عالی، بلندمرتبه، سرافراز 2 مشعوف

**exam** /ɪɡˈzæm/ *noun*
تاقی‌کاری، تاقی‌کردنەوە: *to pass/fail an exam* ◌ امتحان

**examen** /ɛɡˈzeɪmɛn/ *noun*, also examen de conscience
تاقی‌کاری ◌ امتحان

**examination** /ɪɡˌzæmɪˈneɪʃn/ *noun*
1 تاقی‌کاری، تاقی‌کردنەوە، تازمایشت، ئاروین، لێکدانەوە: *to sit an examination in mathematics* 2 (پزشکی) تێ‌ڕوانین یان لێ‌ڕوانین 3 لێکۆڵینەوە، پەیجۆری، فەکۆلین 4 لێ‌پرسینەوە ◌ 1 امتحان 2 معاینه 3 بررسی،

تحقیق 4 بازرسی
**examinee** /ɪɡˌzæmɪˈniː/ *noun*
کەسێ کە تاقیکاری دەدا، تاقیکاریدەر، تاقیکراو ◌ امتحان‌دهنده
**examiner** /ɪɡˈzæmɪnə(r)/ *noun*
تاقیکاریدەرهێن، دەرهێنەری تاقیکاری ◌ ممتحن
**example** /ɪɡˈzɑːmpl, US -ˈzæmpl/ *noun*
1 نموونە، میناک، وێنە، بابەت، سەرمەشق: *This dictionary has many examples of how words are used* 2 ڕێگا، ڕێوشوێن 3 وانە، پەند، چام 4 هاوتا، تا، وێنە ◌ 1 مثال، نمونه، مورد، الگو 2 روش 3 عبرت 4 مانند
**exampled** *adjective*
خاوەن‌وێنە، نموونەی هەیە، تای هەیە ◌ دارای مانند
**exanthema** /ɪkˈsanθɪmə, US ˌɛksanˈθiːmə/ *noun, pl.* exanthemata
زیپکە، گەرمەژنە ◌ جوش، بثورات جلدی
**exanthematic** *adjective*
سەربە زیپکە یان گەرمەژنە ◌ وابسته به جوش یا بثورات جلدی
**exarch** /ˈɛksɑːk/ *noun*
1 (کلیسەی ئۆرتۆدۆکس) گەورەئۆسقوف، سەرئۆسقوف 2 (مێژوویی) ستانوانی هەرێمێکی دوور لە ئیمپراتۆری بیزانتین (بنەڕەت: لە *exarkhos* یونانی، لە -*ex* "لە دەرەوەی" + *arkhos* "میر") ◌ 1 اسقف اعظم 2 استاندار
**exarchate** /ˈɛksɑːkeɪt/ *noun*
(مێژوویی) هەرێمی بەڕێوەبراو لە لایەن exarch ـەوە ◌ اکسارکیت
**exasperated** /ɪɡˈzæspəreɪtɪd, US -ˈzɑːsp-/ *adjective*
تووڕە، ڕقهەستاو، جاڕز، نارزی، سەخت ◌ عصبانی، خشمگین
**exasperating** /ɪɡˈzæspəreɪtɪŋ, US -ˈzɑːsp-/ *adjective*
ڕقهەستێن، تووڕەکەر، شێتکەر (exasperatingly *adv*) ◌ عصبانی‌کننده
**exasperation** /ɪɡˌzæspəˈreɪʃn, US -ˈzɑːsp-/ *noun*
ڕقهەستاوی، قەڵسی، تووڕەیی، جاڕزی، نگرین، نازر: *a groan/look/sigh of exasperation* ◌ عصبانیت
**Excalibur** *noun*
ئێکسکالیبور: شمشێرەکەی ئارتور Arthur (پادشا) ◌ اکسکالیبور
**ex cathedra** /ˌeks kəˈθiːdrə/ *adverb, adjective*
1 (فەرمی و دینی) لە جێی دەسەڵاتەوە، بەپێی (پێویستبوونی) دەسەڵات، بەپێی دەسەڵاتی پێسپێردراوەوە: *The Pope was speaking ex cathedra* 2 دەسەڵاتدارانە ◌ 1 به مقتضای قدرت 2 قدرت‌مدارانه
**excavation** /ˌekskəˈveɪʃn/ *noun*
1 هەڵکەندن، کۆڵین، هەڵکۆڵین، دانەوە، کنەکاری، لەژێرخۆڵ‌دەرهێنان: *The -avations are open to the public* 2 قوڵکە، چاڵ 3 شوێنی هەڵکەندن یان هەڵکۆڵین (بنەڕەت: لە *excavare* ،*excavat-* لاتین "هەڵکەندن و دەردان، بۆش‌کردن "hollow out") ◌ 1 حفر، کاوش، حفاری 2 گودال 3 محل حفاری
**excavator** /ˈekskəveɪtə(r)/ *noun*
1 کنەکار، هەڵکەن، کۆڵینگەر 2 دەزگای هەڵکەندن یان دانەوە، لودێر، ئەتلەس ◌ 1 حفار، کاوشگر 2 ماشین حفاری
**exceeding** *adjective, adverb*
(کۆن) لەرادەبەدەر، یەکجار زۆر، بێ‌ئەندازە ◌ فوق‌العاده
**exceedingly** /ɪkˈsiːdɪŋli/ *adverb*
(فەرمی) لەرادەبەدەر(انە)، یەکجار زۆر، exceptionally ،very ،extremely ◌ فوق‌العاده
**excellence** /ˈeksələns/ *noun*
سەرکەوتن، یەکجار باش‌بوون، لەسەرتربوون، باش‌تری، سەرتریی، بەسەداشکانەوە، سەرووەیی، باڵاتریی، باشی، چاکی، ئیمتیاز، قان: *a reputation for academic -ellence* ◌ تفوق، برتری، تعالی، علو، مزیت
**Excellency** /ˈeksələnsi/ *noun*
بەڕێز، ڕێزدار، جەنابی بەڕێز ◌ عالی‌جناب، جناب عالی
**excellent** /ˈeksələnt/ *adjective*
لەسەرەوە، باش، عال، یەکجارباش، قۆز، خاس، چاک، یەکجار باشە!: *an excellent meal* ◊ *excellent service* ◌ عالی، فوق‌العاده، عالی است!
**excellently** /ˈeksələntli/ *adverb*
زۆر چاک، یەکجار باش ◌ بسیار خوب
**excelsior** /ɛkˈsɛlsɪɔː/ *adjective, noun*
*adj* باشتر، چاتر، عالتر *n* تەڵەزمە، تەلاش‌وتەڵەزم، ورکەدار، خاکەدار ◌ *adj* عالی‌تر، بهتر *n* تراشه
**except** /ɪkˈsept/ *preposition, conjunction*
بێجگەلە، جگەلە، ژبلی، مەگەر، ئاوارتە، unless: *They all came* ◊ *daily except Sundays* ◊ *Our dresses were the same -cept mine was red* ◊ *except Baram* ◌ بجز، به استثنای
**excepted** *adjective*
بێجگەلە، جگەلە، مەگەر ◌ به استثنای
**excepting** *preposition*
بێجگەلە، جگەلە، جیا لە، بەبێ، بەدەر لە ◌ بجز، جز

**exception** /ɪk'sepʃn/ *noun*
1 هەڵاواردن، جگەکردن، جیاکاری، بەدەری، ئاوارتـە 2 شـت یـان بابـەتێکی هـەڵاواردراو، بەدەرە، جەبە، شتی ئاوارتـە 3 ناپەسندکردن، دەربڕینی نارەزایەتی، بەرپەرچ‌دانەوە ◌ 1 استثنا 2 مورد استثنا 3 اعتراض

**exceptionable** /ɪk'sepʃən(ə)bl/ *adjective*
(فـەرمـی) شـیاوی بەرپـەرچ‌دانـەوە، ناپەسـند دەکـرێ، objectionable (exceptionably *adv*) ◌ قابل اعتراض

**exceptional** /ɪk'sepʃənl/ *adjective*
ئاوارتە(یی)، هەڵاوارتە، بەدەر، نائاسایی، جەبە، یەکجارباش، بێ‌هاوتا، بێ‌وێنە، هەڵکەوتوو، :outstanding *an exceptional number of rainy days* ◊ *exceptional skill* ◌ استثنایی، بی‌نظیر، فوق‌العاده

**exceptionalism** *noun*
ئاوارتـەگـەری: بـاوەڕدۆخی جیـاوازبوون لـە پێودانـگ یـان نۆرمـێ؛ تیـۆری ئاوارتـەگـەری (exceptionalist *adj*) ◌ استثناگرایی

**exceptionally** /ɪk'sepʃənəli/ *adverb*
بـە شـێوەیەکی ئاوارتـە یـان هـەڵاوارتـە، نائاسایی‌یانە ◌ به طور استثنایی

**exceptive** /ɪk'septɪv/ *adjective*
ئاوارتە(یی)، هەڵاوارتەیی، نائاسایی ◌ استثنایی

**excerpt** /'eksɜːpt, US -sɜːrpt/ *noun*
بڕگە، پارچە، تیکە، کۆپلە، پارچەی هەڵبژاردە: *Read the following excerpt from one of Milton's poems* ◌ قطعه، گزیده، قطعه‌ی منتخب

**excess** /ɪk'ses/ *noun, adjective*
*n* 1 زیـادەڕەوی، رادەبـەزێنی، لـە ئەندازەدەرچوون، بێ‌درێژی، بێ‌پارێزی 2 زیاد، زیـادی، زیـایی، زیـاتر لـە پێویـست، زۆری، سەرووزیاد، زیدە: *You can throw away any excess* 3 برێکی زیاد 4 دەسبڵاوی 5 (excesses) زیـدەڕەوی‌یـەکان، خـراپکـاری‌یـەکان، تونڕەوی‌یەکان، تاوانەکان، دەس‌درێژی‌یەکان 6 هەڵـسوکـەوتی نائاسـایی و توندڕەوانـە *adj* زیادی، زیایی، زیاد ◌ *n* 1 افراط 2 مازاد، وفور 3 مقـدار اضـافی 4 اسـراف 5 (در جمـع) فجـایع، تجاوزات 6 رفتار غیرعادی و افراط‌آمیز *adj* اضافی

**excess baggage** *noun*
سەربار، زیدەبار، ناوبار، ناقبار، ناوکۆ، مزۆدک ◌ اضافه‌بار

**excess demand** *noun*
زیـدەداخوازی، داوا(کـار)ی زیـادی، داخـوازی زیادی ◌ تقاضای اضافی

**excess fare** *noun*
سـەرکرێ، زیدەکرێ، کرێی زیـادی ◌ کرایـەی اضافی

**excessive** /ɪk'sesɪv/ *adjective*
زیـاد، لـە رادەبـەدەر، لـە ئەندازەبـەدەر، بـێ‌داد، :inordinate :immoderate *The amounts she borrowed were not excessive* ◌ مفـرط، بیش از حد

**excessively** /ɪk'sesɪvli/ *adverb*
لـە رادەبـەدەر، خـراپ، لـە ئەندازەبەدەرانـە: *excessively high prices* ◌ به حد افراط

**excessiveness** /ɪk'sesɪvnəs/ *noun*
زیادی، لە رادەبەدەری، لە ئەندازەبەدەری ◌ بیش از حد بودن

**excess luggage** = excess baggage

**excess postage** *noun*
خەرج یان تێچوونی پۆستی زیادی، زیدەپۆستی، داشکاندن یان لێ‌دەرکردنی پارە (یان پـوول) ◌ کسر تمبر

**excess supply** *noun*
زیدەبەرهـەم، زیدەخـستنەبازار، خـستنەڕووی زیادی، خستنەبازاری زیادی، زیادی خستنەبازار ◌ عرضه‌ی اضافی

**exchange** /ɪks'tʃeɪndʒ/ *noun*
1 ئـاڵوویـر، گۆڕینـەوە، سەربەسـەر، ئاڵـشت، ئاڵوگۆڕ: *2 an exchange of glances/insults* گۆڕین (دراو) 3 بورس، بازاڕ 4 پارەگۆڕینەوە، سـەڕڕافی: *5 currency exchange facilities* دمەدمـە، شەڕەقـسە، مـشتومـڕ 6 ناوەنـدی تەلـەفون، تەلـەفون‌خانـە ◌ 1 مبادلـه، تبـادل، معاوضه 2 تبدیل (ارز) 3 بورس 4 صرافی 5 جر و بحث 6 مرکز تلفن

**exchangeability** /ɪks,tʃeɪndʒə'bɪləti/ *noun*
لەگۆڕینـەوەهاتوویی، لـەئاڵوگۆڕهـاتوویی ◌ قابلیت تعویض، مبادله‌پذیری

**exchangeable** /ɪks'tʃeɪndʒəbl/ *adjective*
لەگۆڕینـەوەهاتوو، دەگـۆڕدرێ، دەگۆڕدرێتـەوە، لـەئاڵوگۆڕهـاتوو: *These tokens are exchangeable for DVDs only* ◌ قابـل تعویض، مبادله‌پذیر

**exchange economy** *noun*
ئابووری گۆڕینەوەیی یان ئاڵوگۆڕی ◌ اقتـصاد مبادله‌ای

**exchange force** *noun*
هێزی گۆڕینەوەیی، هێزی گۆڕینـەوە ◌ نیـروی تبادلی

**exchange rate** *noun*
بەهای پارەی وڵاتێ لەچاو پارەی وڵاتێکی‌تر، نرخی گۆڕینی دراو، نرخ یان بایی گۆڕینـەوە ◌ نرخ برابری

**exchange rate mechanism** *noun*
میکـانیزمی کـۆنترۆڵکـردنی exchange rate نێوان پارەی وڵاتێک و وڵاتێکی‌تر ◌ سـازوکار نرخ برابری

**exchange reaction** *noun*

(کیمیا) کاردانەوە یان پەرچەکرداری گۆڕینەوەیی ◌ واکنش تبادلی

**exchequer** /ɪks'tʃekə(r)/ *noun*
1 گەنجینە، خەزانە، خەزێنە (حکومەت) 2 (the Exchequer) (لە بریتانیا) وەزارەت یان شالیارگەی دارایی (بەرپرسی پارەی گشتی) ◌ 1 خزانه 2 (the Exchequer) وزارت خزانەداری

**excipient** /ɛk'sɪpɪənt/ *noun*
مەتریالی روون یان تراوکەرەوەی دەرمان ◌ اکسیپینت

**excise** /'eksaɪz/ *noun*
1 باج (ناراستەوخۆ، لەسەر کەل‌وپەلی نێوەوی وڵات) 2 بەڕێوەبەرایەتی باج ◌ 1 باج غیرمستقیم 2 ادارەی مالیات

**exciseman** *noun, pl.* excisemen
باج‌گر ◌ مأمور وصول مالیات

**excision** /ɪk'sɪʒn/ *noun*
1 (پزشکی) هەڵکێشان، دەرکێشان، بڕین، لابردن، هەڵگرتن: *to demonstrate three types of surgical excision* 2 لابردن، پەڕاندن، قرتاندن، سانسۆر: *The numerous excisions have destroyed the literary value of the text* ◌ 1 برداشتن، قطع 2 سانسور

**excitability** /ɪk,saɪtə'bɪləti/ *noun, also* excitableness
لەورووژانهاتوویی، (زوو)بزواوی، لەخرۆشانهاتوویی، زووخرۆشاوی ◌ تحریک‌پذیری

**excitable** /ɪk'saɪtəbl/ *adjective*
لەورووژانهاتوو، (زوو)بزواو، دەبزوێنری: *excitable cells*، لەخرۆشانهاتوو، وروژاو، هەژیو، فیشەکی، زووهەڵچوو، زوو دێتەجۆش، جینگزی، ئاڵەتی، هەڵتوز، زووخرۆشاو، هەڵچوو ◌ تحریک‌پذیر، عصبی

**excitant** /'eksɪt(ə)nt, ɪk'sʌɪt(ə)nt, ɛk-/ *adjective, noun*
وروژێنەر، هەژێنەر، خرۆشێنەر، هاندەر: *excitant drugs* ◌ مهیج

**excited** /ɪk'saɪtɪd/ *adjective*
خرۆشاو، هەژیو، وروژاو، بزواو، شاگەشکە ◌ هیجان‌زده

**excitedly** /ɪk'saɪtɪdli/ *adverb*
وروژاوانە، بە خرۆشانەوە ◌ با هیجان

**excitement** /ɪk'saɪtmənt/ *noun, also* excitation
1 شاگەشکەیی، وروژان، خرۆشان، ئاروژان، هەژان، خرۆش، جۆش‌وخرۆش، جۆش، بزوان 2 بزواندن، هاندان، وروژاندن، خرۆشاندن، هەژاندن 3 رووداوی هەژێنەر، شتی وروژێنەر ◌ 1 هیجان، برانگیختگی 2 تحریک، تهییج 3 واقعەی هیجان‌انگیز، چیز مهیج

**exciter** *noun*
1 وروژێنەر، هەژێنەر، هاندەر 2 ئاژاوەگێر ◌ 1 انگیزان 2 آشوب‌گر

**exciting** /ɪk'saɪtɪŋ/ *adjective*
وروژێنەر، هەژێنەر، هاندەر، بزوێنەر: *an exciting story/discovery* ◌ مهیج

**excitingly** /ɪk'saɪtɪŋli/ *adverb*
وروژێنەرانە، هاندەرانە، هەژێنەرانە ◌ به طور هیجان‌انگیز

**excitive** *adjective*
وروژێنەر، هەژێنەر، هاندەر، بزوێنەر ◌ مهیج

**excitor** *noun*
1 (کارەندامناسی) دەماری وروژێنەر، دەماری هاندەر 2 ئاژاوەگێر ◌ 1 عصب محرک 2 آشوب‌گر

**excl** *abbreviation* 1 excluding 2 exclusive

**exclamation** /,ekskl ə'meɪʃn/ *noun*
1 سەرسوورمان، تاسان، دەربڕینی سەرسوورمان 2 هاوار، ناڵە 3 ئاگادارکردنەوە، هۆژداری 4 نیشانەی سەرسوورمان ◌ 1 شگفتی، اظهار شگفت 2 فریاد 3 اخطار 4 علامت تعجب

**exclamation mark** *noun,* US exclamation point
نیشانەی سەرسوورمان (!) ◌ علامت تعجب

**exclamatory** /ɪk'sklæmətri, ek-, US -tɔ:ri/ *adjective*
سەرسوورهێنەرانە، سەرسوورمێن، سەرسوورمانی تیایە یا دەردەبڕێ: *an -tory phrase* ◌ تعجبی

**exclave** /'ɛkskleɪv/ *noun*
بەشێکی خاکی وڵاتێ کە خاکی بێگانە تەواو دەوری داوە (بڕوانە enclave، لە -ex[1] + enclave) ◌ اکسکلیو

**exclosure** /ɪk'skləʊʒə, US ɛk-/ *noun*
ناوچەیێ کە گیانەوەرە ئاوەکییەکانی تیا دەردەکرێ ◌ اکسکلوسور

**excluding** /ɪk'sklu:dɪŋ/ *preposition*
بێجگەلە، جگەلە، ژبلی: *Lunch costs £10 per person, excluding drinks* ◌ بجز، به غیر از

**exclusion** /ɪk'sklu:ʒn/ *noun*
1 رێ(گە)نەدان، نەهێشتن، پێش‌گرتن، بەرگرتن، بەرگیری، رێلێ‌گرتن، لەدەرەوە راگرتن 2 رێ‌گرتن لە هاتنەژوورەوە، قەدەغەکردن، دەرکردن، وەدەرنان، دەرپەڕاندن، پەرکردن، پاتراندن، خستنەدەرەوە: *Exclusion of air creates a vacuum in the bottle* 3 بێبەری، بێبەشی، بێبەش‌کردن، بێبەری‌کردن 4 هەڵاواردن، ئاوارتە 5 لابردن 6 لەبەرچاونەگرتن، گوێ‌پێنەدان 7 بەربەندی (exclusionary *adj*) ◌ 1 منع ورود 2 اخراج، طرد 3 محرومیت، محروم‌سازی 4 استثنا 5 حذف 6 صرف‌نظر 7 تحریم

**exclusion principle** *noun, also* Pauli exclusion principle

بنەمای پاوان: بنەمایێکی فیزیک کە پێی وایە دوو پارچۆلکە (وەک ئێلێکترۆنەکان) لە گەردیلە یان گەردیلەیەکدا ناتوانن هەمان دەستە ژمارەی کوانتۆمی هەبێ ◌ اصل انحصار

**exclusion zone** *noun*
ناوچەی بەربەندکراو یا قەدەغەکراو ◌ منطقەی ممنوعه

**exclusive** /ɪk'sklu:sɪv/ *adjective, noun*
*adj* 1 تایبەتی، تایبەتدراو، تەرخانکراو، بێهاوتا: *exclusive rights to televise the World Cup* 2 داخراو (دەستە یان کۆمەڵەیێ)، پاوانکراو، تایبەتی، قۆرخکراو: *He belongs to an exclusive club* 3 هەڵبژاردە 4 تەنیا، تاک *n* (بابەت، هەواڵ یان چیرۆکێ) تایبەتدراو، تەرخانکراو (رۆژنامە یا کۆڤار)، راپۆری تایبەتی ◌ *adj* 1 خصوصی، منحصر به فرد 2 بسته، انحصاری 3 گزیده 4 صرف *n* گزارش اختصاصی

**exclusively** /ɪk'sklu:sɪvli/ *adverb*
تەنیا، بەتەنیا، بە تایبەت: *a charity that relies almost exclusively on voluntary contributions* ◌ صرفاً، منحصراً

**exclusiveness** /ɪk'sklu:sɪvnəs/ *noun*, also exclusivity /ˌeksklu:'sɪvəti/
بێهاوتابوون، تاکبوون، بەتەنیابوون ◌ منحصر به فرد بودن

**exclusive of** *preposition*
بێجگەلە، جگەلە، بێ: *there were four of us exclusive of the guide* ◌ بجز، بدون

**excogitation** /eksˌkɑ:dʒɪ'teɪʃn/ *noun*
1 لێکۆڵینەوە، بیرکردنەوە، (تێ)رامان، هزر 2 داهێنان ◌ 1 بررسی، تفکر، اندیشه 2 اختراع

**excogitative** /eks'kɑ:dʒətertɪv/ *adjective*
داهێنەرانە، بیری، هزری ◌ اختراعی، اندیشه‌ای

**excommunicable** /ˌekskə'mju:nəkəbəl/ *adjective*
شیاوی بێبەریکردن یان تەکفیر ◌ شایستەی تکفیر

**excommunicant** /ˌɛkskə'mju:nɪk(ə)nt/ *noun*
کەسی تەکفیرکراو یان دەرکراو ◌ آدم تکفیرشده

**excommunicate** /ˌɛkskə'mju:nɪkət/ *adjective, noun*
*adj* بێبەریکرداو، دەرکراو، تەکفیرکراو *n* کەسی تەکفیرکراو ◌ *adj* تکفیرشده *n* آدم تکفیرشده

**excommunication** /ˌekskəˌmju:nɪ'keɪʃn/ *noun*
بێبەریکردن، بێبەشکردن، تەکفیر (بێبەریکردن لە ماف و پریڤیلیجەکانی ئەندامێتی کلێسەی کریستیانیەت ب.ت. کلێسەی کاسۆلیکی رۆمانی)، دەرکردن: *They were threatened with -nication* ◌ تکفیر، اخراج

**excommunicative** /ˌekskə'mju:nɪkertɪv/ *adjective*
بێبەرییانە ◌ تکفیرآمیز

**excommunicator** *noun*
بێبەریگەر، تەکفیرکار ◌ تکفیرکننده

**excommunicatory** /ˌekskə'mju:nɪkətɔ:ri/ *adjective*
بێبەرییانە ◌ تکفیرآمیز

**excoriation** /ˌɪkˌskɔ:ri'eɪʃn/ *noun*
1 سەرکۆنە، بەسەرداهاتن، بەگژداهاتن، رەخنەی توند 2 رووشان، داماڵکان، تۆخماخکردن، داماڵکاندن، پێستلێکردنەوە ◌ 1 نکوهش، انتقاد شدید 2 خراش، پوستکنی

**excrement** /'ekskrɪmənt/ *noun*
پیسایی، ریخ، گوو، تەرسەقول، ترۆل، لاز، شیاکە، لاسک، تەرس: *the pollution of drinking water by untreated human excrement* ◌ مدفوع، براز

**excremental** /ekskrɪ'mɑntl/ *adjective*, also excrementitious /ˌekskrɪme'ntʃəs/
سەربە پیسایی، تەرسی، ریخی ◌ وابسته به مدفوع، فضله‌ای

**excrescence** /ɪk'skresns/ *noun*
لوو، سندان، گرێ، بەر، کوچکە، لک، قوتکە، زیادەگۆشت، چەکەرە، قوورت: *warty excrescences in the colon* ◌ غده، زائده

**excrescent** /ɪk'skresnt/ *adjective*
زیادی، قوتەوەبوو، دەرپەڕیو (excrescently *adv*) ◌ زائد

**excreta** /ɪk'skri:tə/ *noun*
پاشەڕۆ یا دەرهاویشتەی لەش (میز، پیسایی و ئارەق) ◌ فضولات بدن

**excretion** /ɪk'skri:ʃn/ *noun*
دەرهاویشتن، دەردان، فڕێدان، دەرهاویشتە، پیسایی ◌ دفع، مدفوع

**excretory** /ɪks'kri:təri, US 'ekskrətɔ:ri/ *adjective*
دەرهاوێژەر، دەردەر، فڕێدەر، سەربە دەرهاویشتن ◌ دفع‌کننده، دفعی

**excruciating** /ɪk'skru:ʃieɪtɪŋ/ *adjective*
1 بەژان، توند، کەسکوون، بەئازار، بەئێش، گران، سەخت: *excruciating pain* 2 لە رادەبەدەر، لە ئەندازبەدەر ◌ 1 شدید، حاد 2 افراطی

**excruciatingly** /ɪk'skru:ʃieɪtɪŋli/ *adverb*
بە توندی، بە سەختی، یەکجار: *excruciatingly embarrassing ◊ uncomfortable -ciatingly ◊ excruciatingly painful ◊ excruciatingly boring* ◌ شدیداً، فوق‌العاده

**excruciation** /ekˌskru:ʃɪ'eɪʃn/ *noun*
ئازاردان، ئەشکەنجەدان، چەوساندنەوە، چرووسانەوە، رەتاندن، ئێشاندن، ئێشپێگەیاندن،

مۆڵەت یان دەستوور permission لە کۆلێژ یا خوێندنگا بۆ نەهاتنەوەی تەنگەتاوی temporary absence ◌ اکسیات

**exec** /ɪɡ'zɛk, US ɛɡ-/ = executive

**execrable** /'eksɪkrəbl/ *adjective*

یەکجار خراپ، ناحەز، ناشیرین، کرێت، بێزاوی، قێزەون، ناخۆش، wretched ،detestable: *execrable hotel food* ◊ *execrable crimes* ◌ افتضاح، شنیع، نفرت‌انگیز

**execrably** /'eksɪkrəbli/ *adverb*

ناشیرینانە ◌ به طور شنیع

**excreted** *adjective*

قێزەون، بێزاوی ◌ نفرت‌انگیز

**execration** /ˌesɪ'kreɪʃn/ *noun*

1 بێزاری، بێزەونی، رقلێبوون، ناخۆشویستن، قینلێبوون، لەعنەت، دۆعالێکردن 2 دەمپیسی، جنێوفرۆشی، دەمشڕی ◌ 1 انزجار، نفرت، نفرین 2 فحاشی

**execratoty** /'esɪ'kreɪtɔ:rɪ/ *adjective*

بێزەون، جێی رقلێبوون، مایەی قین(لێبوون) ◌ نفرت‌آمیز

**executant** /ɪɡ'zɛkjʊt(ə)nt, US ɛɡ-/ *noun*

1 راپەڕێنەر، جێبەجێکەر، بەڕێوەبەر، 2 موسیقاژەن performer ◌ 1 مجری 2 نوازنده

**executable** /'eksəkju:təbl/ *adjective*

(کامپیوتێر، فایل یان بەرنامەیێ) جێبەجێ دەکرێ، جێبەجێ دەبێ، دەکرێ، رادەپەڕێ، ڕان دەبێ ◌ اجراپذیر

**execution** /ˌeksɪ'kju:ʃn/ *noun*

1 کوشتن، لەسێدارەدان (بە سزای قانوونی‌یەوە): *Over 200 executions were carried out last year* 2 جێبەجێکردن، راپەڕاندن، بەجێهێنان، پیادەکردن، کردن، ئەنجامدان 3 خولقاندن، مامۆستایی، دەسڕەنگینی، شارەزایی، بەرهەمهێنان (فیلم، کتێب و هتد) 4 گرتن، دەس‌بەسەرداگرتن، گلدانەوە 5 شێوەی کردن یان جێبەجێکردن ◌ 1 اعدام 2 اجرا، انجام 3 آفرینش، زبردستی 4 توقیف 5 طرز عمل

**executioner** /ˌeksɪ'kju:ʃənə(r)/ *noun*

جەلاد، لەسێدارەدەر، پیاوکوژ، میری سەربڕ ◌ جلاد، دژخیم

**executive** /ɪɡ'zekjətɪv/ *adjective, noun*

1 *adj* راپەڕێنەرانە، بەڕێوەبەر، راپەڕێنەر، هەڵسووڕێنەر، جێبەجێکار: *the executive offices* 2 پایەبەرزانە: *an -ecutive car/home* 1 *n* دەسەڵات یان هێزی جێبەجێکردن یان راپەڕاندن، دەزگای جێبەجێکردن یان راپەڕاندن 2 دەستەی جێبەجێکردن، لێژنەی راپەڕاندن 3 بەڕێوەبەر (executively *adv*) ◌ 1 *adj* 2 اجرایی، اجراکننده 2 اعیانی 1 *n* قوه مجریه 2 هیأت اجرائی 3 مدیر

ئازاری توند ◌ تعذیب، عذاب شدید

**exculpation** /ˌekskʌl'peɪʃn/ *noun*

(بە)بێ‌گوناهی (ناسران)، بێ‌تاوانی، پاکانە، ڕووسووری ◌ تبرئه، برائت

**exculpatory** /ɪk'skʌlpeɪtəʊrɪ, US -tɔrɪ/ *adjective*

لەگەڵ پاکانە، بێ‌گوناهانە ◌ تبرئه‌آمیز

**excurrent** /ek:skɜ:rənt/ *adjective*

دەر(ە)ڕێژ، هەڵقوڵیو، لێ‌دەرەوەهاتوو، دەرپەڕیو ◌ جاری‌شونده

**excursion** /ɪk'skɜ:ʃn, US ɪk'skɜ:rʒn/ *noun*

1 گەڕان (بە دەستە)، گەڕوانی، گەشت، سەیران، سەیاحەت، تور 2 لادان، لەڕێ‌دەرچوون ◌ 1 گردش، سیاحت، تور 2 انحراف

**excursionist** *noun*

گەڕوان، گەڕیدە، گەشتیار ◌ سیاح

**excursive** /ɪk'skɜ:sɪv/ *adjective*

1 گەڕۆک، سەرلێشێواو، ئاوارە، لاداو، ڕێهەڵکردوو، لەڕێ‌دەرچوو، خریایی 2 لێک‌هەڵوەشاو، لێک‌ترازاو ◌ 1 سیار، سرگردان 2 متقطع، بی‌ربط

**excursively** /ɪk'skɜ:sɪvli/ *adverb*

لاداوانە، لادەرانە ◌ منحرفانه

**excusable** /ɪk'skju:zəbl/ *adjective*

شیاوی لێ‌خۆش‌بوون، جەبە دەکرێ، بەخشین‌هەڵگر، دەبەخشرێ، لەبەخشین‌هاتوو (excusably *adv* ;excusableness *n*) ◌ قابل گذشت

**excursus** /ɪk'skɜ:səs, US ɛk-/ *noun*, same or excursuses

1 پاشکۆ (ڕوونکردنەوەی خاڵێ لە کتێب) 2 لادان (لە باسی دەقێکی نووسراو) ◌ 1 ضمیمه 2 انحراف، گریز

**excusatory** /ɪk'skju:zətɔ:rɪ/ *adjective*

لێبووردن‌خوازانە، بە لێبووردن‌خوازی‌یەوە ◌ با عذرخواهی

**excuse** /ɪk'skju:s/ *noun*

1 بیانوو، بۆنە، بەهانە، بیانک، پەڵپ، هەواڵە بە گەواڵە، دەساوێز، بیانووی ژێرانە: *Late again! What's your excuse this time?* 2 لێبووردن‌خوازی ◌ 1 عذر، بهانه، دلیل معقول 2 پوزش‌خواهی

**excused** *adjective*

لێبووراو، بەخشراو، جەبەکراو، ئازاد ◌ معاف

**excuse-me** *noun*

(نافەرمی) بمبوورە، جۆرێ سەما یان هەڵپەڕکێ ◌ اکس‌کیوزمی

**ex-directory** *adjective*

نەنووسراو، نهێنی، نەهێنی (ژمارەیێ لە ژمارەنامەی تەلەفوندا)، unlisted ◌ محرمانه

**exeat** /'ɛksɪat/ *noun*

**executive board** *noun*
دەستەی جێبەجێکردن، لیژنەی ڕاپەڕاندن ۞ هیأت اجرایی

**executive committee** *noun*
دەستەی جێبەجێکردن، لیژنەی ڕاپەڕاندن ۞ هیأت عامل

**executive council** *noun*
ئەنجومەنی جێبەجێکردن، ئەنجومەنی ڕاپەڕاندن ۞ مجلس اجرایی

**executive director** *noun*
بەڕێوەبەری جێبەجێکردن ۞ مدیر اجرایی

**executive officer** *noun*
کاربەدەستی جێبەجێکردن یان ڕاپەڕاندن ۞ مأمور اجرایی

**executive privilege** *noun*
ئیمتیاز یان پریڤیلیجی ڕاپەڕاندن یان جێبەجێکردن ۞ امتیاز اجرایی

**executive session** *noun*
کۆبوونەوەی نهێنی دەستەی جێبەجێکردن یان لیژنەی ڕاپەڕاندن ۞ جلسەی محرمانەی هیأت اجرائی

**executor**[1] /ɪgˈzekjətə(r)/ *noun*
سەرووەسیەت، وەسی، سەرپەرشت، ڕاسپێراو ۞ وصی، قیّم

**executor**[2] /ɪgˈzekjətə(r)/ *noun*
ڕاپەڕێنەر، جێبەجێکەر: *She appointed him executor of her will* ۞ اجراکننده

**executorial** /-ˈtɔːrɪəl/ *adjective*
(دەگمەن) ڕاپەڕێنەرانە، جێبەجێکەرانە ۞ اجرایی

**executoship** *noun*
سەرووەسیتی، سەرپەرشتی ۞ وصایت

**executrix** /ɪgˈzɛkjuːtrɪks, ɛg-/ *noun, pl.* executrices /-trɪsiːz/ or executrixes
سەرووەسیت، سەرپەرشت، وەسی (ژن) ۞ وصی، قیّمه

**exedra** /ˈɛksɪdrə, ɪkˈsiːdrə, ɛk-/ *noun, pl.* exedrae /-driː/
(بیناسازی) میز یان سەکۆی دانیشتن ۞ سکوی نشیمن

**exegesis** /ˌeksɪˈdʒiːsɪs/ *noun, pl.* exegeses /-siːz/
لێکدانەوە، ئازەنتی، ڕاڤە، شیکردنەوە (ب.ت. نووسراوەیەکی دینی؛ بنەڕەت: *exēgēsis* یۆنانی، لە *exēgeisthai* "لێکدانەوە") ۞ تفسیر

**exegete** /ˈɛksɪdʒiːt/ *noun*
لێکدەرەوە، شیکەرەوە، ڕاڤەکار (کتێبی پیرۆز) ۞ مفسر

**exegetic** /-ˈdʒɛtɪk/ *adjective*, also exegetical
لێکدانەوەیی، شیکردنەوەیی، ڕاڤەیی ۞ تفسیری

**exegetics** *noun, pl.*
زانستی لێکدانەوە، ڕاڤەناسی ۞ علم تفسیر

**exemplar** /ɪgˈzemplɑː(r)/ *noun*
نموونە، میناک، وێنە، سەرنموونە، نموونەی دیار، سەرمەشق، هاوتا، وێنە: *an exemplar of medieval architecture* ۞ اسوه، مثال بارز، سرمشق، نظیر

**exemplarily** *adverb*
بە شێوەیێکی نموونە ۞ به طور نمونه

**exemplary** /ɪgˈzempləri/ *adjective*
1 نموونە، میناک، سەرمەشق: *Her behaviour was exemplary* 2 شایانی لاسایی کردنەوە، پەسەند، یەکجارباش، پەسەند. 3 commendable ئاگادارکەرەوە، پەندئاوی ۞ 1 نمونه، سرمشق 2 درخور پیروی 3 اخطاردهنده

**exampli gratia** /ɪgˈzemplɪ ˈgreɪʃɪə/ *adverb*
(لاتین) بۆ نموونە، بۆ وێنە (بە کورتی eg. دەنووسرێ) ۞ مثلاً

**exemplification** /ɪgˌzemplɪfɪˈkeɪʃn/ *noun*
1 نموونەهێنانەوە، تێگەیاندن بە نموونە، هەڵدانی نموونە یان وێنە 2 لەبەرهەڵگرتنەوە 3 نموونە، میناک، وێنە ۞ 1 ذکر مثال 2 استنساخ 3 مثال

**exemplum** /ɪgˈzɛmpləm, ɛg-/ *noun*, exempla
نموونە، میناک، مودێل: *an exemplum of heroism* ۞ مثال، الگو

**exempt** /ɪgˈzempt/ *adjective, noun*
*adj* (بێ)بەخشراو، تەرخان، جەبەکراو، هەڵاوێردراو، هەڵاوێردە *n* کەسێکی تەرخان یان بەخشراو لە باج ۞ *adj* معاف *n* اگزمپت

**exempted** *adjective*
(بێ)بەخشراو، تەرخان، جەبەکراو، هەڵاوێردراو، هەڵاوێردە ۞ معاف

**exemption** /ɪgˈzempʃn/ *noun*
1 بەخشراوی، هەڵاوێردراوی، جەبە 2 تەرخانبوون، تەرخانیتی، بەخشران لە باج ۞ 1 معافیت 2 معافیت از مالیات

**exenteration** /ɪkˌsɛntəˈreɪʃ(ə)n, US ɛk-/ *noun*
1 هەناودەرکێشان، نێوزگدەرهێنان 2 دەرهێنانی گۆی چاو و شتەکانی تری نێو چاڵی چاو ۞ 1 اندرونەبرداری 2 اکسنتراسیون

**exequatur** /ˌeksɪˈkweɪtə/ *noun*
بەرات، دەستوورنامەی کۆنسول یان نوێنەرێکی تری حکومەتی بیانی (بنەڕەت: لە لاتینەوە بە واتای "لەی گەرێ با بیکا") ۞ روانامه

**exequies** /ˈeksɪkwɪ/ *noun, pl., sing* exequy
(فەرمی) ڕێوڕەسمی ناشتن ۞ مراسم تدفین

**exercise** /ˈeksəsaɪz, US -sərs-/ *noun*
1 وەرزش، وەرزشت: *Swimming is good exercise* 2 مەشق، تەمرین 3 کارکردن، بەکارهێنان، کەڵک لێوەرگرتن، خستنەکار،

لەکارکردن، کارپێکردن 4 مەشقی سەربازی، ڕاهێنان، مانۆڤر 5 (exercises) (سەربازی) مەشق، ڕاهێنان، مانۆڤر 6 ڕێوڕەسم، ئاهەنگ ⬡ 1 ورزش 2 تمرین 3 بەکارگیری، اعمال، استفاده 4 مانور 5 (در جمع) مانور 6 مراسم

**exercise bike** *noun*
چەرخی مەشق، دووچەرخەی مەشق ⬡ دوچرخەی تمرین

**exercise book** *noun*
دەفتەرۆکە، دەفتەرچە، پەڕاوی چکۆلە ⬡ دفترچه

**exercise yard** *noun*
حەوشەی مەشق یان ڕاهێنان (لە زیندانا) ⬡ حصار تمرین ورزش

**exercitation** /ɪɡˌzɜːsəˈteɪʃn/ *noun*
مەشق، کارکردن، تەمرین ⬡ تمرین

**exergue** /ɪkˈsəːɡ, ɛkˈsəːɡ, ˈɛksəːɡ/ *noun*
1 جێگای نووسراوەی نیشان یان کۆین، جێگای ڕێکەوت 2 لێوار یان قەراخی کۆین ⬡ 1 اکسرگو 2 حاشیەی سکه

**exertion** /ɪɡˈzɜːʃn, US -ˈzɜːrʃ-/ *noun*
1 هەوڵ، تێکۆشان، کردوکۆش، تەقەلا، ڕەتان، زەحمەت، ڕەنج، تقەلەخۆدان، لێنەوین، هێزلێنان، هێزلێدان، چالاکی جەستەیی یان هۆشی: *He needed to relax after the exertions of a busy day at work* 2 بەکارهێنان، خستنەکار: *the exertion of force/strength/authority* ⬡ 1 تلاش، تقلا، زحمت، سختی، زورورزی، فعالیت بدنی یا ذهنی 2 اعمال

**exertive** /ɪɡˈzɜːtɪv/ *adjective*
لێنەویو، نەویو، هێزلێنەر ⬡ زورزننده

**exfiltration** *noun*
پاشەکشێ، کشانەوە (سەرباز یان سیخوڕ بە نهێنی) ⬡ عقب‌نشینی

**exfoliant** *noun*
دەرمانێ بۆ لابردنی خانە مردووەکانی پێست ⬡ اکسفولیانت

**exfoliation** /eksˌfəʊliˈeɪʃn/ *noun*
1 توێکڵ‌فڕێدان، کرانەوە 2 توێ‌توێ‌بوون، پێستەپێستەبوون 3 توێکڵ، توێژ، توێخ 4 تاشین ⬡ 1 پوست‌اندازی 2 ورقه‌ورقه شدن 3 پوسته 4 تراش

**ex gratia** /ˌeks ˈɡreɪʃə/ *adjective, adverb*
(لاتین) پیاوەتی‌یانە، لە ڕووی پیاوەتی‌یەوە، نەدانەوە ⬡ بلاعوض

**ex gratia payment** *noun*
(لاتین) پێدانی پیاوەتی‌یانە، ناتەرکانە، پێدانی لە ڕووی پیاوەتی‌یەوە یان نەدانەوەیی ⬡ پرداخت بلاعوض

**exhalant** /ekˈsheɪlənt/ *adjective*, also exhalent
هەڵمیو، سەرچوو، سەروەڕۆ: *an exhalant siphon of a clam* ⬡ متصاعد

**exhalation** /ˌekshəˈleɪʃn/ *noun*
1 هەناسەدانەوە 2 دانەدەری، دەرکردن، (هەڵم، گاز و هتد) emanation ⬡ 1 بازدم 2 برون‌داد

**exhaust** /ɪɡˈzɔːst/ *noun*
1 ئیگزۆز، هەڵمدانەوە، گازدانەوە 2 دووکەڵی ئیگزۆز 3 لوولە یان بۆری ئیگزۆز، لوولەدووکەڵ ⬡ 1 اگزوز 2 دود اگزوز 3 لوله‌ی اگزوز

**exhausted** /ɪɡˈzɔːstɪd/ *adjective*
1 ماندوو، شەکەت، هیلاک، کەوەڕە، ڕەتاو، بێ‌قەوەت، لەپەل‌وپۆکەوتوو، لەپێ‌کەوتوو: *to feel completely/utterly exhausted* ◊ *The exhausted climbers were rescued by helicopter* 2 تەواوبوو، هەڵچۆڕاو، بەکارهێنراو: *You cannot grow crops on exhausted land* (exhaustedly /ɪɡˈzɔːstɪdli/ *adv*) ⬡ 1 خسته، ازتوان‌افتاده 2 تمام‌شده

**exhaustible** /ɪɡˈzɔːstəbl/ *adjective*
کەم، بەرتەسک، هەڵدەچۆڕێ، تەواو دەبێ ⬡ تمام‌شدنی

**exhausting** /ɪɡˈzɔːstɪŋ/ *adjective*
شەکەت‌کەر، ماندووکەر، لەبن‌هێنەر، پرووکێنەر، سەخت: *an exhausting day at work* (exhaustingly /ɪɡˈzɔːstɪŋli/ *adv*) ⬡ خسته‌کننده، فرساینده

**exhaustion** /ɪɡˈzɔːstʃən/ *noun*
1 لەپێکەوتن، زۆرماندوویی، ڕەتان، شەکەتی: *suffering from physical/mental/nervous exhaustion* 2 هەڵچۆڕان، لەبن‌هاتن، تەواوبوون، بەکارهێنران، لەبن‌هێنان، خلاس‌بوون، دواهاتن، تەواوکردن، بەتاڵکردن: *the exhaustion of natural resources* ⬡ 1 ازپاافتادگی، فرسودگی 2 اتمام، تخلیه

**exhaustive** /ɪɡˈzɔːstɪv/ *adjective*
گشتگیر، گشتگرەوە، تەواو، گش(ت)لایەنە، تەواو، دووروودرێژ، thorough: *an exhaustive investigation* ◊ *exhaustive research/tests* ◊ *This list is not intended to be exhaustive* (exhaustiveness *n*; exhaustivity *n*) ⬡ جامع، فراگیر، کامل

**exhaustively** /ɪɡˈzɔːstɪvli/ *adverb*
گشتگیرانە، گش‌لایەنانە، بە شێوەیەکی تەواو: *Every product is exhaustively tested before being sold* ⬡ به نحو جامعی

**exhaust-pipe** *noun*
لوولە یان بۆری ئیگزۆز، لوولەدووکەڵ ⬡ لوله‌ی اگزوز

**exhibit** /ɪɡˈzɪbɪt/ *noun*
1 شتی بەرچاوخراو، شتێ بۆ ڕانان، کەل‌وپەلی پیشان‌دراو، پیشانە 2 (ماف) بەڵگە 3 دەرخستن،

پیشان‌دان، خستنەڕوو، هەڵخستن 4 (لە ئەمریکا) پیشانگا ◌ 1 کالای نمایشی 2 مدرک 3 ارائه، عرضه 4 نمایشگاه

**exhibition** /ˌeksɪˈbɪʃn/ *noun*
1 پیشانگا 2 پیشاندان، خستنەبەرچاو، نیشان‌دان، خستنەڕوو، هەڵخستن، نواندن، ڕانان 3 (لە بریتانیا) باربۆ یان پیتاکی خوێندن، یارمەتی خوێندن ◌ 1 نمایشگاه 2 نمایش، عرضه، ارائه 3 کمک هزینەی تحصیلی

**exhibitioner** *noun*
خوێندکارێ کە لە ڕێگای باربۆی خوێندنەوە درێژە بە خوێندن دەدا، (خوێندکاری) بورسیە ◌ اکزیبیتونر

**exhibitionism** /ˌeksɪˈbɪʃənɪzəm/ *noun*
1 خۆپیشان‌دان، خۆشیرین‌کردن، خۆنواندن 2 خۆدەرخستن ◌ 1 خودنمایی 2 عورت‌نمایی

**exhibitionist** /ˌeksɪˈbɪʃənɪst/ *noun*
1 خۆپیشاندەر 2 خۆدەرخەر ◌ 1 خودنما 2 عورت‌نما

**exhibitionistic** *adjective*
خۆدەرخەرانە، سەربە خۆدەرخستن ◌ وابستە بە عورت‌نمایی

**exhibitive** /ɪgˈzɪbɪtɪv/ *adjective*
بەرچاوخەر، پیشاندەر ◌ نمایش‌دهندە

**exhibitor** /ɪgˈzɪbɪtə(r)/ *noun*
1 بەشداریکەر (پیشانگا) 2 پیشاندەر ◌ 1 شرکت‌کنندە 2 نمایش‌دهندە

**exhilarated** *adjective*
شاگەشکە، شاد، دڵشاد، دڵخۆش، بەکەیف، سەرخۆش، سەرمەست: *I felt exhilarated after a morning of skiing* ◌ مشعوف، بەوجدآمدە

**exhilarating** /ɪgˈzɪləreɪtɪŋ/ *adjective*
زۆرخۆش، شادی‌هێن، دڵخۆش‌کەر، وروژێنەر، هەژێنەر: *My first parachute jump was an exhilarating experience* (exhilaratingly *adv*) ◌ وجدآور، مهیج

**exhilaration** /ɪgˌzɪləˈreɪʃn/ *noun*
شادی، دڵخۆشی، شاگەشکەیی، سەرخۆشی، سەرمەستی، خۆشی: *the exhilaration of performing on stage* ◌ وجد، شادمانی، فرح

**exhortation** /ˌegzɔːˈteɪʃn, US -zɔːrˈt-/ *noun*
1 داوا، داخوازی، پاڕانەوە، تکا 2 هان‌دان، تێن‌دان 3 ڕاسپاردن، ئامۆژگاری‌کردن، نەسیحەت، شیرەت‌کردن 4 ناچارکردن، پێکردن (بە ئامۆژگاری)، پێداگرتن، سووربوون ◌ 1 درخواست، تمنا، التماس 2 تشویق 3 سفارش، اندرزدهی 4 اصرار

**exhortative** /ɪgˈzɔːtətɪv/ *adjective*, also exhortatory
ئامۆژگاری‌یانە، هان‌دەرانە ◌ نصیحت‌آمیز، ترغیبی

**exhumation** /ˌekshjuːˈmeɪʃn/ *noun*
قەبردانەوە، گۆڕدانەوە، مردوودەرهێنان (بۆ تاقی‌کردنەوە) ◌ نبش قبر

**exigency** /ˈeksɪdʒənsi, US ɪgˈzɪdʒ-/ *noun*, also exigence, *pl.* exigencies
1 پێداویستی، (بارودۆخی) تەنگەتاوی، ڕەوشی نائاسایی، ڕەوش یان هەڵومەرجی تەنگەتاوی 2 (exigencies) پێداویستی‌یەکان ◌ 1 ضرورت، وضع فوق‌العادە 2 (در جمع) مقتضیات، ضروریات

**exigent** /ˈeksɪdʒ(ə)nt, US ˈegzɪ-/ *adjective*
1 تەنگەتاوی، تەنگاڤی، پێویست، دەسبەجێیی، کت‌وپڕی، ناکاوی 2 سەخت، دژوار، قورس، پڕئەرک ◌ 1 اضطراری، فوری، مبرم 2 شاق

**exigible** /ˈɛksɪdʒɪb(ə)l, US ˈɛgzɪ-/ *adjective*
پێویست، داوا دەکرێ، داواکردەنی ◌ مقتضی، مطالبەکردنی

**exiguity** /ˌeksəˈgjuːɪti/ *noun*, *pl.* exiguities
کەمی، وردی، بچووکی، scantiness ◌ کمی، خردی

**exiguous** /egˈzɪgjuəs/ *adjective*
کەم، ورد، بچووک، ناتەواو، نیوەچڵ، *exiguous evidence* :inadequate (exiguousness *n* ;exiguously *adv*) ◌ اندک، ناچیز، خرد

**exile** /ˈeksaɪl, US ˈegzaɪl/ *noun*
1 دوورخستنەوە، شاربەدەرکردن: *to be/live in exile* 2 کەسی دوورەوەخراو، شاربەدەر: *political exiles* ◌ 1 تبعید 2 شخص تبعیدی

**exiled** *adjective*
دوورەوەخراو (کەس)، شاربەدەر ◌ تبعیدی

**exilic** /ɪgˈzɪlɪk, ɪk-, ɛg-, ɛk-/ *adjective*
سەربە سەردەمی شاربەدەری، ب.ت. جووەکان لە بابل لە سەدەی شەشی بەرلە زایین‌دا ◌ اگزیلیک

**exine** /ˈɛksɪn, US -ʌɪn/ *noun*
(ڕووەکناسی) دەرەپۆش، دەرەڕیشاڵ، بەرگی دەرەوەی دژەرزینی دەنک یان تۆوی هەڵاڵە ◌ اکسین

**existence** /ɪgˈzɪstəns/ *noun*
1 بوون، بوونەوەری، هەبوون، ژیان، ژین، ژیوار، مان، هەیی، بوونەوەر، بوونایەتی، بوونێتی 2 ڕوودانی ڕاستەقینە: *existence of a state of war* ◌ 1 وجود، هستی، بود، زندگی، حیات، موجود، موجودیت 2 اگزیستنس

**existence of God** *noun*
بوونی خودا ◌ هستی خداوند

**existence symbol** *noun*
هێمای بوون ◌ نماد وجودی

**existent** /ɪɡˈzɪstənt/ *adjective, noun*
بوونـەوەر، ژینـەوەر، هەیـە، هـەیی، existing: (فەلـسەفە): *creatures existent in nature*: شتێ کە بە راستی هەیە یان بوونی هەیە: *The self is the only knowable -istent* ◌ موجود

**existential** /ˌeɡzɪˈstenʃəl/ *adjective*
1 سـەربە بـوون 2 سـەربە تیـۆری بـوونناسـی (existentially *adv*) ◌ 1 وجودی 2 وابسته بـه نظریەی هستی گرایی

**existentialism** /ˌeɡzɪˈstenʃəlɪzəm/ *noun*
بوونگەری، بـوونخـوازی، ئێگزسیتێنشـیالیزم ◌ هستی گرایی

**existentialist** /-ʃəlɪst/ *noun, adjective*
*n* بـوونگـەر، بـوونخـواز: *Sartre was an existentialist* *adj* بوونخوازانـه ◌ *n* هـستی گرا *adj* هـستی گرایانه

**existing** /ɪɡˈzɪstɪŋ/ *adjective*
1 بوونـەوەر، هـەیی 2 هەنووکـەیی، ئێـستا(یـی): *New laws will soon replace -ing legislation* ◌ 1 موجود 2 فعلی

**exit** /ˈeksɪt, US ˈeɡzɪt/ *noun*
1 دەرچـوون، چوونـەدەرێ، رێگـای دەرچـوون، دەرچە: *There is a fire* ◊ *Where's the exit?* *2 exit on each floor of the building* رۆیـشتن، چوونـەدەرێ، بـەجێهێـشتن (ئەکتـەر لەسەر شانۆ): *The heroine made her exit to great applause* 3 مـردن، مـەرگ، سـەرنانەوە ◌ 1 خـروج، در خـروج، بـرونراه 2 عزیمـت 3 درگذشت

**exit poll** *noun*
راپرسـی (نافـەرمی) لـە دەنگـە دراوەکـان ◌ نظرسنجی از رأی دادەها

**exit visa** *noun*
ڤیزای دەرچـوون یـا چوونـەدەرێ ◌ روادیـد یـا ویزای خروج

**ex libris** *noun, pl.* ex libris = bookplate

**Exmoor** *noun*
ئیکـسمۆر: 1 جـۆرێ نـژادی مـەرێ شـاخداری Devonshire ی ئینگلتـەرە (رووبـەرەکـەی 83 کیلـۆمیتری چوارگۆشـە) 2 جـۆرێ رەگـەزی ئەسپی کورتەباڵا، رەسەنی دەڤەری Exmoor ئینگلتەرە ◌ اکسمور

**exo-** *prefix*
پێـشگر: دەر، دەرەوە، لـە دەرەوە، دەرەوەیـی، دەرەکـی: (بنـەرەت: لـە *exō* :exoskeleton یۆنانی‌یەوە "outside") ◌ پیشوند: برون، بیـرون از، بیرونی

**exobiological** *adjective*
سـەربە زیندەناسـی گـەردوونی ◌ وابـسته بـه زیـستشناسی فضایی

**exobiologist** *noun*
زیندەناس لە بواری گـەردووندا ◌ زیـستشناس فضایی

**exobiology** *noun*
زیندەناسی گەردوونی ◌ زیـستشناسی فضایی

**exocarp** /ˈeksəʊkɑːp/ *noun*
(رووەکناسی) توێی دەرەوەی pericarpی میوه ◌ اگزوکارپ

**exocentric** /ˌeksəʊˈsentrɪk/ *adjective*
(زمانـــەوانی) دەرەناوەنـــد، دەروەناوەنـــد، دەرڤـــەناوەند، وەکـــوو *John slept* (دژی endocentric) ◌ برونمرکز

**exocrine** /ˈeksəʊkraɪn, -krɪn, US ˈeksəkrɪn, -kriːn/ *adjective, noun*
*adj* 1 دەرەرێـژ، دەروەرێـژ، سـەربە رژێنـەی دەرەرێـژ یـان دەردراوەکـەی 2 (بڕوانـه exocrine gland – *n* (endocrine ◌ اگزوکرین، برونتراو

**exocrine gland** *noun*
رژێنـەی دەرەرێـژ یـان دەروەرێـژ ◌ غـدەی اگزوکرین یا برونتراو

**exocyclic** *adjective*
دەرەبازنـەیی، دەروەئاڵـقەیی، هـەڵکەوتـوو لـە دەرەوەی بازنـە یـان ئاڵـقەیێکـی پێکهاتـەیێکـی کیمیایی ◌ اگزوسایکلیک

**exocytosis** /ˌeksəʊsaɪˈtəʊsɪs/ *noun, pl.* exocytoses
(زیندەناسی) ئیکسۆسایتۆز یا ئیکسۆسایتۆسیس: ئازادکردنی ناوەرۆکی بۆشایی خانەیێ بۆ دەرەوە ◌ اکسوسیتوز، اکسوسایتوز، اکسوسایتوسیس

**exocytotic** *adjective*
سەربە ئیکسۆسایتۆسیس ◌ وابسته به اکسوسیتوز یا اکسوسایتوسیس

**exodermis** *noun*
دەرەپێست، پێستی دەرەوە ◌ برونپوست

**Exod** *abbreviation* Exodus

**exodus** /ˈeksədəs/ *noun*
1 کـۆرەوی، کۆچـرەوی، کـۆچ: *the mass exodus from Paris to the country in the summer* 2 هـــوروژم، شـــاڵاو، تـــێرژان 3 (Exodus) کتێـب یـان سـیفری کـۆچ (= نـاوی دووەمـین بەشـی کـتێبی پـیرۆز، سـەبارەت بـە کۆچی ئیسـرائیلی‌یەکان لە ساڵی 1300 ی پێش زایـین لـە میـسرەوە بـۆ کـەنعان) ◌ 1 خـروج جمعی، مهاجرت 2 هجوم 3 (Exodus) سفر خروج

**exodontics** *noun, pl., pl.* exodontia
لقـێ لـە dentistry لـەمـەڕ کێـشانی ددان (exodontist *n*) ◌ اکزودونتیک

**exoenzyme** *noun*
هەوێنـە یـا ئانزیمی دەرەوەی خانـەیی ◌ آنـزیم برون سلولی

**exoergic** *adjective*

وزەبــەردەر، ئازادکــەری وزە یــان هێــز ◇ رهاکنندەی انرژی یا نیرو

**exoerythrocytic** *adjective*
لە دەرەوەی خرۆکەسوورەکانی خوێندا رووددا ◇ اکسواریتروسیتیک

**ex officio** /ˌeks əˈfɪʃiəʊ, US -ʃioʊ/ *adjective, adverb*
لەبەر کار یان پۆست، لەبەر خاتری پۆست، لەبەر پلەوپایەی: *an ex officio member of the committee* ◇ به اعتبار مقام

**exogamous** /ekˈsɒgəməs, US -ˈsɑːg-/ *adjective*, also exogamic
دەرەهاوســـەر، سەربەدەرەهاوســـەری ◇ برونهمسر، وابسته به برونهمسری

**exogamy** /ekˈsɒgəmi, US -ˈsɑːg-/ *noun*
1 (مــرۆڤناسـی) دەرەهاوسـەری، ژنهێنـان و شووکردن لە دەرەوەی خێڵ و تیرە و هتد (بڕوانە endogamy) 2 (رووەکناســی) جیــاپیتێنی ◇ 1 cross-pollination بــرونهمـــسری 2 دگرآمیزی

**exogenic** /ˌɛksə(ʊ)ˈdʒɛnɪk/ *adjective*
دەرەپێکهـات (پێکهـاتوو یـان رووداو لەسـەر عەرز) ◇ اکوژنیک

**exogenous** /ɪkˈsɒdʒɪnəs, US ɛk-/ *adjective*
دەرەگەشندە، دەرەوەهەڵدەر، لەدەرەوەشینبوو، دووپەل (exogenously /ɪkˈsɒdʒɪnəsli, US ɛk-/ *adv*) ◇ نامی از خارج، دولپه

**exoneration** /ɪgˌzɒnəˈreɪʃn, US -ˌzɑːnə-/ *noun*
پاکانە، (ناسـران بـە)بێگوناهی، رووسـووری، ئازادی ◇ تبرئه، معافیت

**exonerative** /ɪgzˈɒnəreɪtiv/ *adjective*
پاکانەلەگەڵ، پاکەنەیییانە ◇ تبرئه‌آمیز

**exonormative** /ɪgzˈɒnəreɪtiv/ *adjective*
(زمانەوانی) دەرەپێوەر(ی)، پێودانگ یان پێوەری دەرەوە، (زمـانی) نـەگونجـاوی دەرەوە: کاتـێ پێوەری زمانێ لە دەرەوەی ناوچەیێکە و وانەی پێدەوترێتەوە یان قسەی پێدەکرێ، ئەوە پێی دەڵـێن دەرەپێـوەر، وەک زمـانی ئینگلیـسی لـەو ولاتانــەی کــە زمــانی رەســەنی (native language) ئەوێ نییە، بەڵکوو زمانی دووهەمە ◇ برونمعیار

**exonuclease** /ˌɛksəʊˈnjuːklɪeɪz/ *noun*
(زیندەکیمیا) هەوێنەیێ کە nucleotide ـەکان یــەک لــە دوای یــەک لــە کۆتـایی گــەردی polynucleotide دا لادەبا ◇ اکسونیوکلئاز

**exophthalamic goitre** = Grave's disease

**exophthalamic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە exophthalamos ـەوە هەیە ◇ وابسته به اکسوفتالاموس

**exophthalamos** /ˌɛksɒfˈθalmɒs/ *noun*, or -almus also exophthalmia
دەرپەڕینی نائاسایی گۆی چـاو، چاودەرپەڕیوی ◇ اکسوفتالاموس

**exoplanet** *noun*
دەرەهەسارە (لە دەرەوەی کۆمەڵەی خۆری‌دا) ◇ اکزوپلانت

**exorbitance** /ɪgˈzɔːbɪtəns, US -ˈzɔːrb-/ *noun*
1 زۆربوون، گرانبوون، لەسەرەوەبوون (نرخ) 2 لــە لەکـــرینـــەهاتوویی، رادەبـــەدەری، ئەندازبـــەدەربوون، پێچـــێبـــوون، ناژیرانـــە، رێتێنەچوون ◇ 1 گزافی 2 مفرط بودن، نامعقولی

**exorbitant** /ɪgˈzɔːbɪtənt, US -ˈzɔːrb-/ *adjective*
یــەکجار زۆر، (یــەکجار) گــران، گرانبــایی، لەکـــرینـــەهاتوو، لەرادەبـــەدەر، بـــێئەنـــداز: ◇ *exorbitant costs/fares/fees/prices/rents* گزاف، بیش از حد

**exorbitantly** /ɪgˈzɔːbɪtəntli, US -ˈzɔːrb-/ *adverb*
لەرادەبەدەر، بێئەنداز: *Prices are -tly high in this shop* ◇ بیش از حد

**exorcism** /ˈeksɔːsɪzəm, US -sɔːrs-/ *noun*
1 تــاسدانــان، جنۆکەبەنــدی، جنۆکــەگری، دێوبەنـــدی، دەرکـــردنی جنۆکـــە و هتـــد، تارمایی‌رەوێنی، نووشتە: *A priest performed an exorcism and afterwards the ghost disappeared* 2 رزگـــاری، نـــەجات ◇ 1 جن‌گیری، تعویذ 2 خلاصی

**exorcist** /ˈeksɔːsɪst, US -sɔːrs-/ *noun*
تـاسدانـەر، جنۆکەبەنـد، دێوبەنـد، جنۆکـەگر، تارمایی‌رەوێن، نووشتەکەر (بە هۆی نوێژ یان جادوو) ◇ جن‌گیر

**exordial** /ɪgzˈɔːdɪəl/ *adjective*
دەسپێکی، پێشەکی‌یانە ◇ مقدمه‌ای

**exordium** /ɪgˈzɔːdɪəm, US eg-/ *noun, pl.* exordiums or exordia
پێشەکی، سەرەتا، دەسپێک ◇ مقدمه، دیباچه

**exoskeletal** *adjective*
سەربە دەر(و)ەئێسکبەندی، دەرەپەیکەری، سەربە ئێسـکەپەیکەری ◇ وابسته به استخوان‌بندی برونی

**exoskeleton** /ˈeksəʊskelɪtn, US ˈeksoʊ-/ *noun*
(گیانــەوەرناســـی) ئێســـکەپەیکەری دەرەوە، دەروەئێســـکەبندی، ئێســـکبەنـــدی دەرەوە، دەرەپــــەیکــــەر (بڕوانــــە endoskeleton) ◇ استخوان‌بندی برونی

**exosmosis** *noun*
دەروەپیــارەتبـووی، دەرتێپـەڕێتی، دادان یــان دەلاندنی دەرەوە یـان دەروویی: 1 دەلانـدن یـان دادانی رووەو دەرەوەی خانـــە یـــان رەگـــێ 2

رۆیینی ماکێ لە شوێنێ بە خەستی (یان پەیتی) زۆرترەوە بەرەو شوێنێ بە خەستی کەمترەوە (لە بەرامبەری endosmosis دا) ◌ اکسوموز

**exosmotic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە exosmosis ـەوە هەیە (exosmotically *adv*) ◌ وابستە بە اکسوموز

**exosphere** /'eksəʊsfɪə (r), US 'eksoʊsfɪr/ *noun*
دەرەگۆ، دەرەسفێر، چینەدەرینە، ئێکسۆسفێر (ناوچەی هەرەدەرەوەی کەشی هەسارەیێ) ◌ اگزوسفر

**exospheric** *adjective*
سەربە چینەدەرینە، سەربە exosphere، پێوەندی بە چینەدەرینەوە هەیە ◌ وابستە بە اگزوسفر

**exospore** *noun*
دەرەسپۆر، سپۆر یا تۆوی دەرەوە، قاپیلکی دەرەوەی سپۆری (exosporal *adj*؛ exosporous *adj*) ◌ برون‌هاگ

**exostosis** /ˌɛksɒs'təʊsɪs/ *noun*, exostoses /-si:z/
دەرەئێسک، دەرپەڕیوی ئێسکی، لووی بێ‌مەترسی شانەی کرۆژەیی لەسەر ئێسکێ ◌ برآمدگی استخوانی

**exoteric** /ˌɛksə(ʊ)'tɛrɪk/ *adjective*, also exoterical
1 دەرەوەیی، دەرەکی 2 ئاسان، سادە، هەموو کەس لەی تێدەگا، گشتی 3 نانهێنی، ئاشکرا (دژی esoteric) ◌ 1 برونی 2 زودفهم، عام 3 غیرسری

**exothermic** /ˌeksəʊ'θɜ:mɪk, US ˌeksoʊ'θɜ:rmɪk/ *adjective*, also exothermal
گەرمیدەر (exothermically *adv*؛ exothermicity *n*) ◌ گرمازا

**exotic** /ɪg'zɒtɪk, US ɪg'zɑ:tɪk/ *adjective, noun*
*adj* 1 ناخۆیی، نابوویی، نابومی، لاوە، بیانی، ناخۆماڵی، بێگانە: *exotic plants* 2 سەیر، نائاسایی 3 جوان، ڕەنگین، سەرنجڕاکێش *n* 1 وشەی بیانی یان تێهاتوو 2 ڕووەک یان گیانەوەری سەیر (یان نائاسایی؛ exotically *adv*؛ exoticism *n*) ◌ *adj* 1 خارجی، بیگانە 2 شگفت‌انگیز، نامتعارف 3 قشنگ، جذاب *n* 1 واژەی دخیل 2 گیاه یا جانور عجیب

**exotica** /ɪg'zɒtɪkə, US ɪg'zɑ:t-/ *noun, pl.*
شتە نائاساییەکان یان سەیرەکان، شتە وروورژێنەکان: *a sale of antiques and exotica* ◌ اشیاء نامتعارف، چیزهای هیجان‌انگیز

**exotic dancer** *noun*
سەماکاری خۆڕووتکەرەوە (لە کاتی سەمادا) ◌ اگزوتیک دانسر

**exoticism** *noun*, also exotism
شتێکی exotic، وەک وشە یان زاراوەیێکی بیانی ◌ اگزوتیسم

**exotoxin** *noun*
دەرەژار(اوک)، ژاراوکی دەرەوە: ماکێکی ژاراوی ئاوەتوواو کە لە لایەن وردەزیندەوەرەکانەوە بەرهەم دێتێ (exotoxic *adj*) ◌ اگزوتوکسین

**exp.** *abbreviation* 1 expenses 2 expired 3 export 4 exported 5 exporter 6 express

**exp** *abbreviation* 1 experience 2 experimental 3 expiry 4 exposures (Photography)

**expanded polystyrene** *noun*
جۆری پلاستیکی سووک کە گازی تیایە، بۆ پێچانەوەی شتەکان بەرلە خستنە نێو سیپ و قوتووەوە بەکاردێتێ ◌ نوعی پلاستیک

**expanded metal** *noun*
تۆڕی تێلی یان وایەری (بۆ توندکردنی کۆنکرێت) ◌ رابیتس

**expanding universe** *noun*
جیهانی پەرەسەندوو، گەردوونی ڕوولەفراوانی ◌ عالم در حال انبساط

**expanse** /ɪk'spæns/ *noun*
1 پانتایی، ڕاخستە، ڕاستایی، بەرینایی: *an expanse of water* ◊ *flat expanses of open farmland* 2 ئاسمان ◌ 1 گسترە، عرصە 2 فلک

**expansibility** /ɪkˌspænsə'bɪlətɪ/ *noun*
لەکشانهاتوویی ◌ انبساط‌پذیری

**expansible** /ɪk'spænsəbl/ *adjective*
لەکشانهاتوو، دەکشێ، دەکشێتەوە ◌ انبساط‌پذیر

**expansibly** *adverb*
لەکشانهاتووانە ◌ به طور انبساط‌پذیر

**expansile** /ɪk'spænsl, US -saɪl/ *adjective*
لەکشانهاتوو ◌ قابل انبساط

**expansion** /ɪk'spænʃn/ *noun*
1 کشان 2 گەورەبوونەوە، فراوانبوونەوە، کرانەوە، بەرینبوونەوە، فشبوونەوە، پانبوونەوە، فرەهبوون، پەرەسەندن، گەشەسەندن، زۆربوون: ◊ *a period of rapid economic expansion* *Despite the recession the company is confident of further expansion* 3 بەرینایی، فراوانی، بەربڵاوی، پانتایی، ڕاخستە، فرەهی (expansional *adj*) ◌ 1 انبساط 2 اتساع، توسعە، گسترش، افزایش 3 وسعت، گسترە، پهنە

**expansionary** /ɪk'spænʃənrɪ/ *adjective*
سەربە کشان، بەرەو پەرەسەندن یان گەشەسەندن، ڕوولە گەشەسەندن: *an expansionary economy* ◌ وابستە بە انبساط، در جهت رشد

**expansion bolt** *noun*
پێچی کشاو یان گەورەوەبوو، بورغی فشەوەبوو ◌ پیچ انبساطی

**expansionism** /ɪk'spænʃənɪzəm/ *noun*
فراوانخوازی، فراوانباوەڕی: *the economic -* ◊ *military/territorial ionism of America*

**exultance** /ɪɡˈzʌltəns/ *noun*, also exultancy /ɪɡˈzʌltənsɪ/
شادی، خۆشی، سەرخۆشی ◌ شادمانی
**exultant** /ɪɡˈzʌltənt/ *adjective*
شاد، خۆش، سەرخۆش، بەکەیف، خۆشحال (exultantly *adv*: بە خۆشییەوە، بە خۆشحالییەوە، شادانە، بە شادییەوە) ◌ شادمان، شاد
**exultation** /ˌeɡzʌlˈteɪʃn/ *noun*
شادی، خۆشی، سەرخۆشی، خۆشحالی، شاگەشکەیی، سەرمەستی ◌ وجد، شادمانی
**exurb** /ˈɛksəːb/ *noun*
ناوچەیێکی پەرەسەندوو لەوبەری دەوروپشتی شارەوە، ناوچەیێکی دەرەوەی شاری ◌ اکسورب
**exurbanite** *noun, adjective*
(کەسێکی) دانیشتووی exurb ◌ اکسوربانیت
**exurbia** /ɛkˈsəːbɪə/ *noun*
ناوچەکانی دەرەوەی شار بە گشتی ◌ اکسوربیا
**exuviae** /ɪɡˈzjuːvɪiː, US ɛɡ-/ *noun, pl.*
(گیانەوەرناسی) کاژ، کاژە، کەراژ، کراس، پێستی فڕێدراو (بنەڕەت: لە لاتینەوە بە واتای "پێست و چەرمی گیانەوەری") ◌ اگزوویا
**exuvial** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە exuviae ـەوە هەیە ◌ وابسته به اگزوویا
**exuviation** *noun*
کەراژفڕێدان، پێستفڕێدان، کراسفڕێدان، کاژخستن ◌ پوستاندازی
**ex-voto** /ɛks ˈvəʊtəʊ/ *noun, pl.* ex-votos
پێشکەشی، دیاری (بۆ جێبەجێبوونی نەزر) ◌ هدیه
**ex-works** *adjective, adverb*
یەکسەر یان ڕاستەوخۆ لە کارخانەوە یان شوێنی بەرهەمهێنانەوە ◌ مستقیم از کارخانه یا محل تولید
**-ey** = -y
**eyas** /ˈʌɪəs/ *noun, pl.* eyasses
شاهین یان بازی هێلانەیی، باڵندەی ناپەڕەوازە ◌ قوش یا باز آشیانی
**eye** /aɪ/ *noun*
1 چاو، چاف، چەم، دیدە، دیە 2 دیتن، بینایی 3 بۆچوون، نیرین، ڕوانین، بینین 4 کون، سو، کوتەسیزە (دەرزی) 5 (پەتاتە) زیپکە، گری 6 (قازانقفڵی) قرتینە 7 (دەریاوانی) ئاڵقە، قەف ◌ 1 چشم، بصر 2 قدرت دید 3 دید، نگرش 4 سوراخ 5 دکمه (سیبزمینی) 6 مادگی 7 حلقه
**eyeball** /ˈaɪbɔːl/ *noun*
گۆی چاو، تۆپی چاو، گلێنە، بیبیلە ◌ کرەی چشم، مقلا
**eyebath** /ˈaɪbɑːθ, US -bæθ/ *noun*
چاوشۆری، چاوشۆرگە، جامی چاو تیاشتنەوە ◌ چشمشویە
**eye bolt** /ˈaɪbɔːlt/ *noun*
پێچی سەرکون ◌ پیچ سر سوراخ
**eyebright** *noun*
گوڵەچاوێشە؟، چاوڕۆشنە؟ [*Euphrasia officinalis*] ◌ نوعی گیاه
**eyebrow** /ˈaɪbraʊ/ *noun*
برۆ ◌ ابرو
**eyebrow pencil** *noun*
میداد یان پێنووسی برۆ ◌ مداد ابرو
**eye-catching** *adjective*
سەرنجڕاکێش، چاوکێش، باڵکێش، چاوگر، چاوڕفێن (eye-catcher *n*: شتی سەرنجڕاکێش) ◌ جالب، گیرا، چشمگیر
**eye-catchingly** *adverb*
سەرنجڕاکێشانە، بە شێوەیێکی سەرنجڕاکێش ◌ به طور جالب
**eyecup** = eyebath
**-eyed** *adjective*
(لە لێکدانا) چاو- ـچاوە ◌ چشم- ـچشمی
**eyedropper** *noun*
دڵۆپێنی چاو ◌ قطرەچکان چشم
**eye drops** *noun*
دڵۆپەی چاو ◌ قطرەی چشم
**eyeful** /ˈaɪfʊl/ *noun*
(کەس یان شتی) دڵڕفێن، سەرنجڕاکێش ◌ (آدم یا چیز) جذاب
**eyeglass** /ˈaɪɡlɑːs, US -ɡlæs/ *noun*
1 چاویلکە (بە یەک چاوە یا هاوێنەوە) 2 = eyepiece ◌ عینک
**eyeglasses** *noun*
چاویلکە، عەینەک، بەرچاوک ◌ عینک
**eyehole** *noun*
کون (ی چاولێکردن) ◌ سوراخ
**eyelash** /ˈaɪlæʃ/ *noun*, also lash
برژانگ، مژۆڵ، کفلیشک: *false -lashes* ◌ مژه
**eyeless** *adjective*
نابینا، بێچاو، کوێر ◌ نابینا
**eyelet** /ˈaɪlət/ *noun*
کون، چاوکە، چاوە، ئاڵقە ◌ سوراخ، حلقه
**eye-level** *adjective*
ڕێکی چاو، لە ڕێک و ئاستی چاو: *an eye-level grill* ◌ همسطح چشم
**eyelid** /ˈaɪlɪd/ *noun*, also lid
پەردەی چاو، پێڵوو، بەلگ، کۆپک ◌ پلک
**eyeliner** /ˈaɪlaɪnə(r)/ *noun*, also linear
هێڵ یان خەتی چاو ◌ خط چشم
**eye-opener** *noun*
1 شتی سەرسووڕهێنەر، شتی سەیر، چاوکەرەوە 2 خواردنەوەیێکی ئەلکولی کە سەرەتای ڕۆژ دەخورێتەوە ◌ 1 چیز شگفتانگیز 2 ای‌اپنر
**eyepatch** /ˈaɪpætʃ/ *noun*

چاوپێچ(ە)، پەڕۆی چاو ◌ بالشتک چشم

**eyepiece** /ˈaɪpiːs/ *noun*

چاوەهاوێنە، هاوێنەی وردبین ◌ عدسی چشمی

**eye-shade** *noun*, also eyeshade

تاوگیر، بەرچاوە، ئافتاوگەردان ◌ آفتاب‌گیر

**eye shadow** /ˈaɪʃædəʊ, US -doʊ/ *noun*

سێبەری چاو ◌ سایەی چشم

**eyeshot** /ˈaɪʃɑːt/ *noun*

هەتەر، چاوبڕ، بەرچاو، سۆما، بڕ، هەنا ◌ دیدرس، چشم‌رس

**eyesight** /ˈaɪsaɪt/ *noun*

بینایی، سۆما، هەتەر، هەنای چاو، دید، بینین: *an eyesight test* ◌ بینایی، دید

**eye socket** *noun*

کاسەی چاو، گۆ یا چاڵی چاو، چاودان، کالانەی چاو ◌ حدقه

**eyesore** /ˈaɪsɔː(r)/ *noun*

دیمەنی ناحەز، دیمەنی ناشیرین: *That old factory is a real eyesore!* ◊ *the old factory has become an eyesore* ◌ منظرەی زننده

**eyespot** *noun*

1 (گیانەوەرناسی) پنکەچاو، چاوەپەڵە، پەڵەچاوە، خاڵەرەنگینە، پنکەرەنگینە: جۆری پنکە یان خاڵی رەنگی رۆشنایی‌هەستیار لەسەر flatworm، starfish و زیندەوەر یان ئۆرگانیزمەکانی تردا 2 پنکەچاو، لکە یان پەڵەیێ کە لە چاو دەچێ (ب.ت. لە پەپوولە و هتد) 2 ژەنگ، نەخۆشییەکی کەرووی دەغڵودان و گژوگیای تر کە خاڵ و پنکەی خڕی زەردباو دەردەکەن ◌ ایسپوت

**eye strain** *noun*

ماندوویی چاو، هیلاکی چاو، چاوماندوویی ◌ خستگی چشم

**Eyetie** /ˈʌɪtʌɪ/ *adjective, noun, pl.* Eyeties

(نافەرمی، بریتانیا و سووکانە) ئیتالیایی ◌ ایتالیایی کثیف

**eye tooth** /ˈaɪtuːθ/ *noun, pl.* -teeth /-tiːθ/

1 ددانی پێشەوەی شەویلکەی سەروو، ددانی بڕەری سەروو 2 (خوازە) شتێکی یەکجار بەبایەخ و بەنرخ ◌ 1 دندان نیش بالا 2 چیز بسیار باارزش

**eye view** *noun*

بەرچاو، خویانک، دیمەن ◌ منظره

**eyewash** /ˈaɪwɒʃ, US -wɑːʃ, -wɔːʃ/ *noun*

1 چاوشۆرە 2 (نافەرمی) = nonsence ◌ مایع شستشوی چشم

**eyewitness** /ˈaɪwɪtnəs/ *noun*

چاونێر، شایەدی بەرچاو: *an eyewitness account of the suffering of the refugees* ◌ شاهد عینی

**eyewink** /ˈaɪeɪŋk/ *noun*

چاوداگرتن، چاوقرتاندن، چاوهەڵتەکاندن ◌ چشمک

**eyeworm** *noun*

کرمی چاو 1 جۆرێکی filarial لە ئەفریکای پشتێنەیی، دەداتە چاو [*Loa loa*] 2 جۆرێ کرمی نیماتود، زۆرتر لە شیردەر یان گوانداره سمدارەکاندا دەبینرێ [توخم *Thelazia*] ◌ کرم چشم

**eyot** /ˈeɪət/ = ait

**eyra** /ˈeɪrə/ *noun*

جۆرێ jaguarundiی قاوەیی سووورباو ◌ ایرا

**eyrie** /ˈɪəri, ˈeəri, ˈaɪəri, US ˈɪri, ˈeri/ *noun*, US also aerie

1 گەران، هێلانەی هەڵۆ (یان باڵندە راوی‌یەکانی تر (وەک واشە یان باز)، زۆرتر لەسەر داری بەرز یان هەڵدێر 2 ماڵ، قەڵا یان شتێ وا کە لە شوێنێکی بەرز وەک گرد یان کێوێ هەڵکەوتبێ 3 (ێ‌باو) بەرەراوکەی brood هێلانەیی، ب.ت. هی باڵندەی راوی (بنەرەت: لە late Latin بە واتای "هێلانەی باڵندەیێکی راوی") ◌ 1 آشیانەی عقاب 2 و 3 آیری

**eyrir** /ˈeɪriːr/ *noun, pl.* aurar /ˈɪrar/

ئێریر: یەکەی پارەی ئایسلەند، بەرامبەر بە سەدیەکی krona ◌ ایریر

**Ezek.** *abbreviation* Ezekiel (in biblical references)

**Ezekiel** /ɪˈzːkɪəl, US -kjəl/ *noun*, also Ezechiel or Ezek, late Latin Ezechiel, Hebrew *Yĕhezqēl*

ئیزکیل، حیزقیل، یەحەزقیل (= یەکێ لە پێغەمبەرانی جوولەکە) ◌ حزقیل

**e-zine** *noun*

ئیفار، ئی‌زین، کۆڤاری ئێلیکترۆنیکی ◌ ای‌زین، مجلەی الکترونیکی

**Ezra** /ˈezrə/ *noun*, late Latin, from Hebrew *ʿEzrā*

1 عیزرا، عێزرا، ئیزرا (یەکێ لە پێغەمبەرانی جوولەکە، لە سەدەی پێنجەمی پێش‌زایین دەژیا، لە بابل Babylon و ئۆرشەلیم Jerusalem) 2 کتێبی عیزرای پێغەمبەر ◌ 1 عزرا 2 کتاب عزرای نبی

# F f

**F**[1], **f** /ef, *pl.* Fs, F's, f's /efs/ *noun*

1 ئێف (= شەشەمین پیتی ئەلفوبێی ئینگلیسی) 2 فا (= چوارەمین نۆتە لە پەیژەی سی ماژۆردا) 3 ئاماژە بە دەنگێ دوای E لە دەستەیێ لە شتەکان، بابەتەکان و هتد 4 شتێک لە شێوەی پیتی F ۞ 1 اف 2 و 3 فا 4 چیز F مانند

**F**[2] 1 symb. the chemical element fluorine 2 Fahrenheit 3 (physics, symb.) force 4 franc(s) 5 farad(s) 6 Fahrenheit 7 (in motor racing) formula 8 fighter (in designations of US aircraft types)

**F**[3] *abbreviation* fellow of

ئەندامی ۞ عضو

**f** *abbreviation* 1 feminine 2 female 3 forte 4 (in racing results) furlong(s) 5 femto- ($10^{-15}$)

1 (ڕێزمان) مێ 2 مێ، مێو (سێکس یان ڕەگەز) 3 بەرز (موسیقا، ئیتالیایی) ۞ 1 (دستور زبان) مؤنث 2 مؤنث (جنس) 3 (موسیقی) بلند

**FA** *abbreviation* Football Association

**fa** /fɑ:/ *noun*

فا (= چوارەمین نۆتە لە پەیژەی سۆڵفادا) ۞ فا

**the FAA** *abbreviation* the Federal Aviation Administration

بەڕێوەبەرایەتی فڕینەوانی فیدراڵ: ڕێکخراوەیێکی organization حکومەتی ئەمریکا کە (تۆڕی) ڕاگواستنی ئاسمانی مەهار دەکا، لە 1958 دامەزرا ۞ افای‌ای

**fab** /fæb/ *adjective*

(نافەرمی، بریتانیا) یەکجار باش، عال، دانقە، سەیر، fabulous، wonderful: *You a -b idea* (fabby *adj*؛ fabbo *adj*) *look fab!* ۞ عالی

**faba bean** /'fɑ:bə/ = fava bean, broad bean

**fabaceous** /fə'beɪʃəs/ *adjective*

(ڕووەک‌ناسی) باقلەیی، تیرەی باقلەیی، لوبیایی ۞ باقلایی

**Fabian** /'feɪbɪən/ *adjective, noun*

1 *adj* هۆشیارانە، ئاگادارانە، بە پارێزەوە، لەسەرەخۆ، هێواش، ئارام، cautious، dilatory 2 بەچۆکداهێنەرانە 3 سەربە کۆمەڵەی فابینەکان یا فابی‌یەکان *n* ئەندامی ئەنجومەنی فابین (کەسێ کە پێی‌وایە بە ڕێگای چاکسازی کەم‌کەمەوە سۆشیالیزم بنیات دەنرێ)، لایەنگری فابیەنیزم ۞ *adj* 1 محتاطانه، آهسته 2 فرسایشی 3 وابسته به فابین‌ها *n* عضو انجمن فابین، طرفدار فابینیسم

**Fabianism** *noun*

فابینیزم، فابیەنیزم (بنەڕەت: لە ناوی سەرداری ڕۆمی‌یەوە Quintus *Fabius* Maximus Verrucosus کە لە شەڕ لەگەڵ هانیباڵ Hannibal زۆر بە هۆشیاری‌یەوە دەجوولاوە و لە شەڕی پونیکی دووەم Second Punic (هانیبالی) تێک شکاند) ۞ فابینیسم

**Fabianist** *noun*

فابینیست، فابیەنیست ۞ فابینیست

**fable** /'feɪbl/ *noun*

1 داستان، چیرۆک، حیکایەت، حەقایەت، ڕاز، ڕازە، جەفەن، نەزیلە، نەزیرە: *Aesop's Fables* 2 ئەفسانە، ئوستوورە، میس، میت *a land rich in fable* 3 هەڵبەستە، درۆ، ناڕاست، falsehood، lie (وتە یا ڕاپۆرێ، بنەڕەت: لە *fable* فەڕەنسی کۆن، لە *fibula* لاتین "story"، لە *fari* "قسەکردن، ئاخاوتن، دووان "speak") ۞ 1 قصه، داستان 2 اسطوره 3 کاذب

**fabled** /'feɪbld/ *adjective*
1 ئەفسانەیی، رازەیی، :legendary *a fabled*
*monster* 2 نارِاستەقینە، خەیالی، ساختە،
هەڵبەستە، fictitious 3 ناسراو، نێودار،
*the team's fabled* :famous ,renowned
*coach* ◌ 1 اساطیری 2 غیرواقعی 3 مشهور
**fabliau** /'fablɪəʊ/ *noun, pl.* fabliaux /-əʊz/
داستان یان ئەفسانەی کێشدار (metrical)،
ب.ت. هەرزانە، شێوەیێ کە لە هۆنراوە
سەرەتاکانی فەرەنسیدا دەبینرێ ◌ فابلیو
**Fablon** *noun*
(دروشمی بازرگانی) جۆرێ پلاستیکی نەرمی
خۆپێوەنووساو یان خوچەسپ، بۆ سەر میز و هتد
◌ فابلون
**fabric** /'fæbrɪk/ *noun*
1 پارچە، کوتاڵ، قوماش: *◊ cotton fabric*
*furnishing fabrics* 2 تانوپۆ، چنراو(ە)، تەقن،
ئەتەم، بنیات، دارِشت، پێکهاتە:. structure
framework: *the fabric of society* ◊ *a*
*trend which threatens the very fabric of*
*society* 3 بینا، خانووبەرە (دیوار و تەرک و
بان) 4 دامەزراندن، دانان، بنیاتنان،
دروستکردن، سازکردن، crection ◌ 1 پارچە
2 بافت، ساختار 3 ساختمان 4 تأسیس
**fabricant** /'fæbrɪkent/ *noun*
دروسکەر، سازکار، سازەر، manufacturer ◌
سازندە
**fabricated** *adjective*
ساختە، درۆ، هەڵبەستە ◌ جعلی، ساختگی
**fabrication** /ˌfæbrɪ'keɪʃn/ *noun*
1 دروسکردن، سازکردن، سازاندن، بنیاتنان،
پێکەوەنان، پێکهێنان، دارِشتن، بەرهەمهێنان،
داهێنان 2 هەڵبەستن، ساختەکاری، فروفێڵکاری
◌ 1 ساختن، تولید، ابداع 2 جعل
**fabricator** *noun*
دروسکەر، سازکار، سازەر، بنیاتنەر، پێکەوەنەر
◌ سازندە
**fabulist** /'fæbjəlɪst/ *noun*
1 ئەفسانەنووس، ئەزیلەنووس، ئەفسانەبێژ،
حیکایەتداهێن، ساز 2 درۆزن، قرِەک ◌ 1
افسانەنویس 2 دروغگو
**fabulous** /'fæbjələs/ *adjective*
1 ئەفسانەیی، ئوستوورەیی، ئەزیلەناسا 2
باوەرِپێنەکراو، نائاسایی، خەیاڵین، سەیر:
*fabulous wealth* 3 یەکجار(گەورە)، یەکجار
باش، بێداد 4 ساختە، هەڵبەستە، درۆ ◌ 1
اساطیری 2 شگفت‌انگیز 3 عالی، محشر 4 جعلی
**fabulously** /'fæbjələsli/ *adverb*
باوەرِپێنەکراوانە، یەکجار ◌ بە طور غیرقابل
تصدیق
**façade** /fə'sɑːd/ *noun*, also facade
1 رووکار، پێشەوەی خانوو، دیوی دەرەوە،
پێشخانوو 2 روالەت، رووکەش، رووی دەرەوە
(ب.ت. فریودەر، دوورکوژ) ◌ 1 نما 2 ظاهر
**face** /feɪs/ *noun*
1 روو، روخسار، ماژە، دەموچاو، سەروسەکوت،
سەروسیما، دیمە، چارە 2 کەسایەتی 3 روالەت،
بەر 4 رووکار، پێشخانوو 5 (کاتژمێر) روو،
مینا 6 لا، روو، بەر، لایەن، ئالی 7 ئابرِوو،
ئابوور، برەو، باوەر، بایەخ 8 روو، رووداری 9
(ئەندازە) هەریەک لە رووەکانی تەنێ 10 (کێو
یان هەڵدێرێ) داوێن، قەدپاڵ، بنار ◌ 1 صورت
2 چهره 3 سیما، ظاهر 4 نما 5 صفحه، سطح 6 وجه،
طرف 7 حیثیت، اعتبار 8 گستاخی 9 فیس 10 دامنه
**face-ache** *noun*
دەماریشە، ژانی دەمار، نۆرالژی ◌ درد عصب
**Facebook** /'feɪsbʊk/ *noun*, trademark
فەیسبووک: جۆرێ بنکە یا وێبسایتی تۆرِی
کۆمەڵایەتی social networking ◌ فیس‌بوک
**face-card** /'feɪs kɑːd/ = court card
**face-cloth** /'feɪsklɒθ, US -klɔːθ/ = flannel
**face-cream** *noun*
کریمی دەموچاو ◌ کرم صورت
**face flannel** = flannel
**face-hammer** /'feɪs hæmə(r)/ *noun*
چەکوشی پان ◌ چکش پهن
**faceless** /'feɪsləs/ *adjective*
بێناونیشان، بێنێو، بێناسنامە، نەناسراو:
*faceless high-rise apartment blocks* ◌
بی‌هویت، ناشناختە
**facelessness** /'feɪsləsnəs/ *noun*
بێناونیشانی، بێنێوی، بێناسنامەیی،
پشتپەردەیی، نەناسراوی ◌ بی‌هویتی، ناشناختگی
**facelift** /'feɪslɪft/ *noun*, also facelifting
1 کێشانی پێستی دەموچاو (برینکاری پزشکی،
بەمەبەستی لابردنی گنج و لۆچی دەموچاو، تا
گەنجتر لە چاو بدا) 2 دەسپاهێنان،
دەسپاگێران، تازەکردنەوە، چاککردنەوە ◌ 1
فیس‌لیفت 2 مرمت، نوسازی
**face mask** *noun*
1 دەمامکی روو، رووبەند، رووپۆش 2 = face
pack ◌ ماسک صورت
**face-off** *noun*
1 شەرِ، کێشە، قرِە، مشتومرِ، دەمەقرِە 2 (لە
هاکی سەرسەهۆڵدا) دەسپێکردنی یاری ◌ 1
مناقشە، دعوا 2 (هاکی روی یخ) آغاز بازی
**face pack** *noun*
پەکی دەموچاو (= کریم یان هەویرئاسایەکە بۆ
خاوێنکردنەوە یان جوانکردنی پێست
بەکاردێنرێ) ◌ ماسک صورت
**face paint** *noun*
رەنگی دەموچاو ◌ رنگ صورت

**faceplate** *noun*
1 پێچکە یان چەرخی لەنگەر 2 تەبەقە یان بەرەیێ لە ئاسن یان دار کە بە پێچکە یان چەرخی دەزگای داتاشینەوە نووساوە 3 پەنجێرەی روونی تاس‌کڵاوی ئاسمانگەڕ astronaut یا شۆفێری ◌ 1 چرخ لنگر 2 و 3 فیس‌پلیت
**face powder** *noun*
گەردەی دەموچاو ◌ پودر
**facer** *noun*
(نافەرمی و زۆرتر لە بریتانیا) 1 زللە، شەپلاخە 2 کێشە یان ئاستەنگی کوت‌وپڕ ◌ 1 سیلی 2 مشکل ناگهانی
**face-saver** *noun*
ئابڕووکەرەوە، ئابڕووڕاگر، ئابڕووپارێز، مایەی (پاراستنی) ئابڕوو ◌ مایەی حفظ آبرو و حیثیت
**face-saving** *adjective*
بە مەبەستی پاراستنی ئابڕوو، ئابڕووپارێزانە: *a face-saving compromise* ◌ بە منظور حفظ آبرو
**facet** /'fæsɪt/ *noun*
1 لا، رووەلە، رووژە (چکۆلێنراوی روو)، بەر، برگە، لاروو (جەواهێر) 2 لایەن، لا، ئالی، قار، بوار: *The report examines every facet of the prison system* 3 (بیناسازی) لێواری کووز یان دیراوە 4 (زیندەناسی) رووژە، رووچە، چاوکە ◌ 1 سطح، تراش 2 وجه، جنبه 3 لبەی قاشقی 4 چشمک
**facetiae** /fə'si:ʃii:/ *noun, pl.*
وێژەی هەرزە ◌ ادبیات مبتذل
**facetious** /fə'si:ʃəs/ *adjective*
شۆخ، شۆخی‌باز، تیتاڵ‌باز، جەفەنگ‌باز، قۆشمە، حەنەکچی، پێکەنینی، گاڵتاوی: *just being facetious* *a facetious comment/remark* ◌ بذلەگو، مضحک
**facetiously** /fə'si:ʃəsli/ *adverb*
بە شۆخی، بە گاڵتەوە ◌ بە شوخی
**facetiousness** /fə'si:ʃəsnəs/ *noun*
شۆخی‌بازی، جەفەنگ‌بازی، شۆخی‌گەری، تیتاڵی ◌ بذلەگویی
**face-to-face** *adjective*
رووبەڕوو، روولەیەک، بەرەوڕوو: *a face-to-face conversation* ◌ روو در روو
**face value** *noun*
1 نێوبایی، بەهای نێوی، نرخی روو، باوەڕبایی 2 نرخی رواڵەتی، واتای رواڵەتی 3 رووی دەرەوە، رواڵەتی شتەکە ◌ 1 ارزش اسمی 2 ارزش ظاهری، معنی ظاهری 3 صورت ظاهر
**faceworker** *noun*
رووکار، کرێکاری سەر رووی کانی خەڵووز ◌ فیس‌ورکر
**facia** = fascia
**facial** /'feɪʃl/ *adjective, noun*
*adj* دەموچاوی، دیمی: *a facial expression* ◊ *n* *facial hair* ماڵشت یان داماڵینی دەموچاو ◌ *adj* وابستە بە صورت *n* ماساژ صورت
**facial nerves** *noun, pl.*
دەمارەکانی دەموچاو ◌ عصب‌های صورت
**facially** /'feɪʃəli/ *adverb*
لە رووی دەموچاوەوە، لە رووی دیمەوە ◌ از لحاظ صورت
**facies** /'feɪʃii:z/ *noun, pl.* same
(زەوی‌ناسی) رواڵەت، روو(ە) ◌ رخسارە
**facile** /'fæsaɪl, US 'fæsl/ *adjective*
1 ئاسوودە، زووگیرکەوتوو، سادە، ئاسان، هێسان، بێ‌زەحمەت، ئاسان‌بەدەس‌هاتوو، بێ‌ڕەنج(گیرکەوتوو)، بێ‌ئەرک، effortless: *a facile remark/generalization* 2 سەرپێیی، بێ‌مایە، فشە، سەرسەرەکی: *a facile victory* 3 نەجێگیر، ناسەقامگیر 4 رەوان، دەم‌پاراو، زمان‌هەڵنەکەوتوو، fluent: *facile prose* ◌ 1 راحت، سهل‌الوصول 2 سطحی 3 بی‌ثبات 4 فصیح
**facilitation** /fə,sɪlɪ'teɪʃn/ *noun*
ئاسانکاری، گری‌کردنەوە، رێ‌خۆش‌کردن، هێسان‌کردن ◌ تسهیل
**facilitative** *adjective*
ئاسانکاری‌یانە، رێ‌خۆش‌کەرانە ◌ تسهیلی
**facilitator** /fə'sɪlɪteɪtə(r)/ *noun*
ئاسانگەر، ئاسانکەرەوە، رێ‌خۆش‌کەر ◌ تسهیل‌کنندە
**facility** /fə'sɪləti/ *noun, pl.* facilities /fə'sɪləties/
1 توانایی، لێهاتوویی، ئامادەیی، توانایی سروشتی، لێوەشاوەی 2 ئاسانی، هێسانی، ئاسوودەیی، بێ‌ئەرکی، سانایی 3 هۆ، کەرەسە 4 شارەزایی، وەستایی 5 رەوانی 6 نەرمی 7 (facilities) ئاسانکاری(یەکان) 8 سازوبەرگ، کەل‌وپەل، دام‌ودەزگا، دەزگاکان ◌ 1 استعداد، قابلیت 2 سهولت، راحتی 3 وسیلە 4 مهارت 5 سلاست 6 ملایمت 7 (در جمع) تسهیلات 8 تجهیزات، لوازم
**facing** /'feɪsɪŋ/ *noun, adjective*
*n* 1 رووکار، رووکێش، رووپۆش: *marble/stone/brick -ngs* 2 بەراوێز (جوانی)، زێوار، شیرازە 3 سووڕان، گۆڕینی ئاست یان لا 2 (facings) یەخە و سەرقۆڵ *adj* 1 رووەو، رووبە، بەرەو ◌ *n* 1 نما 2 سجاف 3 چرخش، تغییر جهت *adj* 1 رو بە 2 (در جمع) مغزی
**facsimile** /fæk'sɪməli/ *noun*
1 روونووس، هەڵگیراوە، کۆپی 2 فەکس ◌ 1 رونوشت، کپی 2 فکس
**fact** /fækt/ *noun*
1 راستی، هەیان، بووە، بوویەر، رووداو، شتی دیار و مسۆگەر، بوونی بەرچاو، راستەقینە 2

زانیاری ◌ 1 واقعیت، واقعه، حقیقت 2 اطلاعات

**fact-finding** *noun, adjective*

*n* لێکۆڵینەوە، ڕاستیدۆزی *adj* لێکۆڵینەوەیی: *a fact-finding mission/visit* ◌ *n* تحقیق *adj* تحقیقی

**faction**[1] /ˈfækʃn/ *noun*

1 باڵ، باسک، قۆڵ، بەرە، دەستە، دەستەسازکردن، دەستەبەندی، باڵبەندی، بەرەبەندی: *rival factions within the administration* 2 دارودەستە، کۆمەڵە 3 دووبەرەکی، ناکۆکی، چەنبەرەکی، ململانێ، کێشە ◌ 1 جناح، جناح‌بندی 2 باند 3 تفرقه، اختلاف، نزاع

**faction**[2] /ˈfækʃn/ *noun*

فیلم یان کتێبی نیمچەڕاست (بنەڕەت: تێکەڵی fact و fiction) ◌ فاکسیون

**factional** /ˈfækʃnəl/ *adjective*

سەربە دەستەبەندی یان دەستەسازی، سەربە بەرەبەندی: *factional ◊ factional conflict rivalries* ◌ وابسته به جناح‌بندی

**factionalism** *noun*

دەستەگەری، دووبەرەکایەتی، فراکسیونالیزم ◌ چنددستگی، فراکسیونالیسم

**factionalist** *noun*

ئەندامی دەستەگەری یان فراکسیونالیزم ◌ عضو فراکسیونالیسم

**factious** /ˈfakʃəs/ *adjective*

دووبەرەکی‌یانە، دووبەرەکی‌نەرەوە، شەڕەنگێز، ئاژاوەگێڕ، پشێوی‌نەرەوە، خومەشێوێنکە، فیتنە؛ حزبی، دەستەدەستە، لە ئەنجامی دووبەرەکی‌یەوە: *-ous disputes* (factiously /ˈfakʃəsli/ *adv*: شەڕەنگێزانە، ئاژاوەگێڕانە) ◌ تفرقه‌انگیز، ستیزه‌جو، فتنه‌جو؛ حزبی، گروهی، ناشی از تفرقه

**factiousness** /ˈfakʃəsnəs/ *noun*

شەڕەنگێزی، ئاژاوەگێڕی، بەیەکادان ◌ ستیزه‌جویی، فتنه‌جویی

**factitious** /fækˈtɪʃəs/ *adjective*

(فەرمی) ناسروشتی، دەسکرد (بەڵام جوان)، ناڕسکە، ساختە، سازکردە، درۆ (factitiously *adv*: دەسکردانە، بە درۆ؛ factitiousness *n*) ◌ غیرطبیعی، تصنعی، ساختگی

**factitive** /ˈfæktətɪv/ *adjective*

(ڕێزمان، کارەکان) پێکهێنەرانە: بە دوای direct object و complement ێ دێن (وەک: "I painted it red" و "they made her captain". painted و made فەکتیتیڤن؛ factitively *adv*) ◌ ایجادی، (وابسته به) کنش نمود

**factive** /ˈfæktɪv/ *adjective*

(زمانەوانی) فەکتیف، ڕاستی‌نوێن (= ئەو کارانە verbی کە لەبارەی شتێکی جێگیر یا فاکتێکی ڕاستەقینەوە دەدوێن، وەکوو: know, realize) ◌ واقعیتی، فاکتیو

**fact of life** *noun*

ڕاستی تاڵ ◌ واقعیت اجتناب‌ناپذیر

**factoid** /ˈfæktɔɪd/ *adjective*

لاڕاستی، ڕاستی ناگرنگ، ڕاستی نیوەچڵ ◌ حقیقت جزئی

**factor** /ˈfæktə(r)/ *noun*

1 کۆلکە، هاوکۆلکە، هۆکار، فاکتێر: *economic factors ◊ the key/crucial/deciding factor* 2 ئاست، ئەندازە، ڕادە 3 نوێنەر، بریکار 4 ژینی دیاریکەر (تایبەتمەندی بۆماوەیی): *Haemophiliacs have no factor 8 in their blood* 5 دەلال، بریکار 6 (بیرکاری) فاکتۆر: *1, 2, 3, 4, 6 and 12 are the factors of 12* ◌ 1 عامل، ضریب 2 درجه، میزان 3 نماینده 4 ژن تعیین‌کننده 5 حق‌العمل‌کار 6 فاکتور، عامل، سازه

**factorage** /ˈfæktərɪdʒ/ *noun*

دەلالانە، حەقی دەلالی، فاکتۆرانە، کۆمیسیۆن ◌ حق‌العمل

**factor analysis** *noun*

شیکردنەوەی هۆکار، هۆکارشیکاری، فاکتێرشیکاری ◌ تحلیل عوامل

**factor VIII** /ˌfæktər ˈeɪt/ *noun*, also factor 8, factor eight

هۆکار یان فاکتێری هەشت، هۆکاری دژەهیموفیلی (ماکێ لە نێو خوێندا و دەیمەیێنێ، هەروەها antihemophilic factor) ◌ عامل هشت

**factorial** /fækˈtɔːriəl/ *adjective, noun*

کۆلکەیی، فاکتۆریێل، لێکدراو ◌ عاملی

**factorization** *noun*

کۆلکەدۆزی، کۆلکەشیکاری، شیکردنەوەی کۆلکەیی ◌ تجزیه‌ی عاملی

**factory** /ˈfæktri, US -təri/ *noun, pl.* factories

1 کارگە، کارخانە: *factory ◊ a car factory workers* 2 (مێژوویی) نوێنەرایەتی یان بریکاری لە دەرەوەی وڵات ◌ 1 کارخانه 2 نمایندگی خارج از کشور

**factory farm** *noun*

کێڵگەی دەزگایی یان میکانیکی، کێڵگەی کارگەیی ◌ مزرعه‌ی کارخانه‌ای

**factory farming** *noun*

ئاژەڵداری دەزگایی یان کارگەیی ◌ دام‌داری کارخانه‌ای

**factory floor** *noun*

کارکەران، کرێکاران (لەچاو بەڕێوەبەرانی)، مەڵبەندی کارخانە، هۆڵی کارگە ◌ محیط کارخانه

**factory hand** *noun*

کرێکاری کارگە یان کارخانە ◌ کارگر کارخانه

**factory ship** *noun*

کەشتی ڕاوەماسی ◌ کشتی شیلاتی

**factotum** /fækˈtəutəm, US -ˈtou-/ *noun,*

*pl.* factotums
1 دامەزراو، راگرتە 2 (فەرمی یان بە شۆخی) کەسێکی هەمەکارە: *I became her assistant and general -um* ◌ 1 مستخدم 2 آچار فرانسە

**fact sheet** *noun*
پەڕ یان بەرگەی زانیاری، زانیاریNامە: *For further details, write in for our free fact sheet* ◌ ورقەی اطلاعات

**the facts of life** *noun*
وردەکاری یان زانیاری رەگەزی ◌ جزئیات یا اطلاعات جنسی

**factual** /ˈfæktʃuəl/ *adjective*
لەسەر بنچینەی راستییەکان، راستەقینە، بنچینەراست، هەیانی، بووەیی، بوویەری، سەربە راستی و فاکتەکان: *a factual account of events* ◌ مبتنی بر واقعیات، واقعی، حقیقی، وابستە بە واقعیات یا فاکت‌ها

**factualism** *noun*
فاکچوالیزم ◌ فاکتوالیسم

**factual judgment** *noun*
بڕیاری راستەقینە ◌ حکم واقعی

**factually** /fæktʃuəli/ *adverb*
لە بواری راستییەکاندا، لە باری راستییەکانەوە ◌ از نظر واقعیات

**facture** /ˈfaktʃə/ *noun*
بنیاتنان، دروستکردن، شارەزایی، لێهاتوویی، execution ◌ سازندگی، مهارت

**facula** /ˈfakjʊlə/ *noun, pl.* faculae /-liː/
(ئەستێرەوانی) گەشەپەڵە، پەڵەی روناکی سەر خۆر، ناوچەی روناکی photosphere ی خۆر (بنەڕەت: لە لاتینی، چکۆلێنراوی *fax* ,*fac-* "چۆڵەچرا، مێلەدە torch") ◌ فاکیولا

**facular** /ˈfakjʊlə(r)/ *adjective*
گەشەپەڵەیی، سەربە یان پێوەندی بە پەڵەی روناک سەر خۆرەوە هەیە ◌ فاکیولار

**facultative** /ˈfak(ə)lˌtətɪv/ *adjective*
1 ئارەزوویی، بەدەسخۆیی، سەرپشکی، مەیلی 2 (زیندەناسی) دەتوانێ بژی لە هەر شوێن و بارودۆخێکدا، سەرپشک: *a facultative parasite* 3 = سەربە faculty ◌ 1 اختیاری 2 فاکولتاتیو، اختیاری

**facultatively** /ˈfak(ə)lˌtətɪvli/ *adverb*
1 بە ئارەزوویی، سەرپشکانە، بە شێوەیێکی مەیلی ◌ بە طور اختیاری

**faculty** /ˈfæklti/ *noun, pl.* faculties
1 توانایی، بەهرە، توانست، تواناداری، لێهاتوویی، لێوەشاوەیی، ئامادەیی، توانایی هۆشی یان جەستەیی، توانستی بیری یان مێنتاڵ، هێزی مێنتاڵ یان زەینی: *the faculty of sight* ◊ *intellectual/critical/artistic faculties* 2 هێز، شیان 3 کۆلێژ 4 لێژنەی زانستی، سەرجەم مامۆستایانی کۆلێژ یان زانکۆیێ: *the Law faculty* ◊ *School faculty* 5 *a faculty meeting* (ب.ت. کلێسە) دەسەڵاتپێدان ◌ 1 استعداد، قابلیت، استعداد ذهنی یا جسمی، کفایت، قوە 2 قدرت 3 کالج 4 هیأت علمی 5 اعطای اختیار

**faculty of concentration** *noun*
توانایی هۆشپێدان ◌ توان تمرکز حواس

**faculty of distinction** *noun*
توانایی لێککردنەوە یا جیاکردنەوە ◌ قوەی تمیز

**faculty of judgment** *noun*
توانایی بڕیار(دان) ◌ قوەی حکم

**faculty of thought** *noun*
توانایی بیرکردنەوە ◌ قوەی تفکر

**faculty of the understanding** *noun*
توانایی تێگەیشتن ◌ قوەی فهم

**fad** /fæd/ *noun*
1 ئارەزوو، ئیشتیا، هەوەس، گز، حەز، سەرقاڵی کاتی: *a fad for physical fitness* 2 داب، دەستوور: *the latest/current fad* 3 کورتماوە، نادرێژخایەن، کاتی، بەرووخت ◌ 1 هوس 2 مُد 3 زودگذر، موقت

**faddiness** *noun*
وازیوازیبوون، تاوتاویبوون، دەمدەمیبوون ◌ دمدمی بودن

**faddish** *adjective*
وازیوازی، تاوتاو، دەمدەمی، مۆدباز ◌ دمدمی، فدیش

**faddism** *noun*
مۆدبازی، باوبازی، باوبازاری، دابباززاری ◌ فدیسم، مدبازی

**faddist** *noun*
کەسێکی وازیوازی، مرۆی تاوتاو، دەمدەمی، مۆدباز ◌ آدم دمدمی، فدیست

**faddy** /ˈfædi/ *adjective* (faddier, faddiest)
1 وازیوازی، راڕا، تاوتاو 2 بەقێزوبێز، بەتروتوپ، بەئەدا و ئەتوار ◌ 1 دمدمی 2 پر ادا و اصول

**fade** /feɪd/ *noun*
لاچوون، لەنێوچوون (بەرەبەرە، سینەما) ◌ محو

**faded** *adjective*
1 کاڵەوەبوو، رەنگڕۆیشتوو 2 لەنێوچوو ◌ 1 رنگ‌رفته 2 محوشده

**fade-in** *noun*
1 بەهێزبوون، پێزداری (بەرەبەرە) 2 بە هێواشی دەرکەوتن، دەرکەوتنی کەمکەمە، کەمکەمڕۆشنبوونەوە (دەنگ یان وێنە) ◌ 1 تقویت تدریجی 2 آشکار شدن تدریجی

**fadeless** *adjective*
1 تیانەچوو 2 نەژاکاو، سیس‌نەبوو 3 رەنگ‌نەڕۆیشتوو، کاڵەوەنەبوو ◌ 1 غیرقابل زوال 2 پژمردەنشدنی 3 دارای رنگ ثابت

**fade-out** *noun*

کەم‌کەم کەم‌بوونەوە، لاچوونی بەرەبەرە (دەنگ و وێنە) ۞ محو شدن تدریجی

**fado** /ˈfɑːdəʊ/ *noun, pl.* fados

جۆرێ گۆرانی گەلی پۆرتوگالی، پتر بە تیمی دڵتەنگانەوە ۞ فادو

**faecal** /ˈfiːkl/ *adjective*

1 سەربە پیسایی یا گوو 2 پەگری، دوردی ۞ 1 وابسته به مدفوع 2 لردی

**faeces** /ˈfiːsiːz/ *noun, pl.* US feces

1 پیسایی، گوو، ریاو(ە) 2 پەگر، دورد، خڵتە ۞ 1 مدفوع 2 رسوب، لرد

**faerie** /ˈfeɪəri, US ˈfɛːri/ = faery

**Faeroese** = Faroese

**faery** /ˈfeəri/ *noun, pl.* faeries

وڵاتی پەری‌یان، پەری‌نشین، پەریستان، fairyland ۞ سرزمین پریان

**faff** /fæf/ *noun*

(نافەرمی) کار یان چالاکی بێ‌ئەنجام ۞ اقدام یا فعالیت بی‌نتیجه

**Fafnir** *noun,* Old Norse *Fāfnir*

هەژدیهایێ لە میتولۆژی نۆرس‌دا کە پاسەوانی گەنج و خەزێنە زێڕەکەی Nibelung دەکا و تا ئەوەی کە بە دەستی Sigurd دەکوژرێ ۞ فافنیر

**fag**[1] /fæg/ *noun*

(نافەرمی، زۆرتر لە بریتانیا) 1 کاری گران، کۆڵەمەرگی، کاری دژوار، زەحمەتی زۆر 2 (نافەرمی) جگەرە 3 شاگردێ ژێردەست ۞ 1 کار شاق 2 سیگار 3 دانش‌آموز زیردست

**fag**[2] /fæg/ *noun*

(نافەرمی، ئەمریکا) قوونەڵە، قوندەر، کوونی (faggy *adj*) ۞ کونی

**fag**[3] /fæg/ *noun*

(نافەرمی، بریتانیا) جگەرە ۞ (عامیانه) سیگار

**fag end** *noun*

1 بنەجگەرە، کنگەسیگار 2 ئاخر، بن، خڵتە، بنژیل، ماگە، تڵتە، پاشماوە (بەکار نەیێ) ۞ 1 ته سیگار 2 ته، ته‌مانده

**fagged** /fægd/ *adjective*

(نافەرمی) هیلاک، ماندوو، شەکەت، کەشتەنگ، exhausted ۞ خسته، کوفته

**fagger** *noun*

زەحمەت‌کێش، رەنج‌کێش، مەینەت‌کێش ۞ جان‌کن

**faggot** /ˈfægət/ *noun,* also fagot

1 (چێشت) کفتە 2 کوونی، گاندەر، قوونەدەر 3 (لە ئەمریکا fagot) چەپکە ئێزنگ، چەپکە چیلکە 4 چەپکەمیل 5 (نافەرمی، بریتانیا) ژنی سووک ۞ 1 کوفته 2 کونی 3 دسته‌ی هیزم 4 فاگوت 5 زن فرومایه

**faggoting** *noun,* US fagoting

دروومان بە شێوەی تەقەڵی حەوت و هەشت ۞ فاگوتینگ

**fah** /fɑː/ = fa

**Faht** = Fahrenheit

**Fahrenheit** /ˈfærənhaɪt/ *noun, adjective*

*n* فەرێنهایت، فارینهایت (پێوەریکی تێمپراچێر، لە ئاوی بەستوو 32° و لە ئاوی کوڵاتوو 212°، هەروەها *adj* (Fahrenheit scale سەربە فارینهایت (بنەڕەت: لە ناوی فیزیازانی ئەڵمانی‌یەوە Gabriel Daniel *Fahrenheit*) ۞ *n* فارنهایت *adj* وابسته به فارنهایت

**faience** /fʌɪˈɒs, feɪ-, -ˈɑːns/ *noun*

(قاپ‌وکەوچک) گڵێنە و چینی (جوانی بە شووشەپۆشراو) ۞ فایانس

**fail**[1] /feɪl/ *noun*

دەرنەچوو، سەرنەکەوتوو، کەوتوو، رەتەوەبوو ۞ ردی

**fail**[2] /feɪl/ *noun,* without fail

بێ‌ئەملاوئەولا، بێ‌چەندوچۆن، حەتمەن ۞ حتماً، یقیناً، مسماً، بی‌بروبرگرد

**failed** /feɪld/ *adjective*

1 سەرنەکەوتوو، سەرنەگرتوو، تێشکاو: *a -iled* 2 بەرشکست(بوو)، *a failed coup ◊ writer* نابوودبوو ۞ 1 ناکام، ناموفق 2 ورشکسته

**failing** /ˈfeɪlɪŋ/ *noun, preposition*

*n* لاوازی، خاڵی لاوازی، کەم‌وکووڕی، کەم‌وکورتی، کێماسی، ناتەواوی، گەرد، عەیب: *◊ She is aware of her own failings prep Jealousy is a very human failing* ئەگەر نەبێ، ئەگەر واش‌نەبێ، لە نەبوونی، بێ: *Ask a friend to recommend a doctor or,- ling that, ask for a list in your local library* ۞ *n* ضعف، نقص، کاستی *prep* در صورت عدم

**faille** /feɪl/ *noun*

فا: جۆرێ پارچەی نەرم و سووک و ڕیڕێ (بنەڕەت: لە فەرەنسی کۆنەوە) ۞ نوعی پارچه

**fail-safe** *adjective*

هەڵەپارێز، گرفت‌پارێز، پارێزدار (دەزگا، کەل‌وپەل و هتد) ۞ محافظ‌دار

**failure** /ˈfeɪljə(r)/ *noun*

1 تێشکان، شکست، نشستی، سەرنەکەوتن، ناکامی، فشەڵ‌هێنان، بێ‌کەوتن: *The attempt ◊ was doomed to failure the problems of economic failure and increasing* 2 *a power failure ◊ unemployment* کەسێکی سەرنەکەوتوو، کاری سەرنەگرتوو: 3 *The whole thing was a complete failure* هەوڵی سەرنەگرتوو 4 نەهاتنەبەرهەم، رەعەمەڵ‌نەهاتن، نەهاتنەبەر 5 لەکار کەوتن، پەک‌کەوتن، خراپ‌بوون، مانەوە 6 کۆتایی، دریخی، کەم‌کاری 7 دەستەوسانی، داماوی،

دامان، نەتوانین، لەدەستنەهاتن، سستی، بێهێزی 8 لاوازی، عەیب، شکستی، کەموکوری، کەمی، گرفت، خراپی 9 تیاچوون، نەمان 10 مایەپووچی، بەرشکستی، نابووتی 11 (کارەبا، گاز و هتد) ڕۆیشتن، پچڕان 12 داشکان، کەمبوونەوە، هاتنەخوارەوە، دابەزین ◌ 1 شکست، عدم موفقیت، ناکامی 2 آدم یا کار ناموفق 3 تلاش ناموفق 4 به ثمر نرسیدن 5 از کارافتادگی 6 قصور 7 واماندگی 8 ضعف، نقص، کاستی، عیب 9 زوال 10 ورشکستگی 11 قطع 12 افت، کم شدن

**fain** /feɪn/ *adverb*. would fain

بە باش‌تر زانین، بە پێخۆشبوون، بە گیانەوە، بە ڕەزامەندی(یەوە): *I would fain do as you ask* ◌ ترجیح دادن، با خشنودی

**fainéant** /ˈfeɪneɪɒ̃/ *noun*

(فەرەنسی) کەسێکی بێخێرە، بێکارە، بەکارنەهاتوو، تەمبوژە ◌ آدم بدردنخور

**faint** /feɪnt/ *adjective* (fainter, faintest), *noun*

*adj* 1 کەم، لاواز، کز، سست، بێهێز، زایف 2 کەم، هیچ، چکۆلە، بری، پرزۆلی 3 بێڕەنگ، ئاوەکی، تراو، کاڵ، کەمڕەنگ 4 سست، بێحاڵ، ترسەنۆک، دوودڵ 5 نەرم، سووک *n* بوورانەوە، بێهۆشبوون، بێهۆشی، گەشکە(کردن)، لەسەرخۆچوون ◌ *adj* 1 ضعیف 2 خفیف، اندک، ناچیز 3 کم‌رنگ، آبکی 4 بی‌حال، ترسو، متردد 5 آهسته *n* غش، بی‌هوشی

**faintest** *adjective*

چکۆلەترین، کەمترین ◌ کوچکترین، کم‌ترین

**faint heart** *noun*

مرۆی ترسەنۆک، حیز، بێجەرگ ◌ آدم ترسو، بزدل

**faint-hearted** /ˌfeɪntˈhɑːtɪd/ *adjective*

ترسەنۆک، بێجەرگ، ترسەنۆکانە، حیزانە: *He tried not to appear faint-hearted* ◌ ترسو، بزدل، بزدلانە

**faint-heartedly** *adverb*

ترسەنۆکانە، حیزانە، ترسنۆکانە ◌ بزدلانە

**faint-heartedness** *noun*

ترسەنۆکی، بێجەرگی، حیزی ◌ بزدلی، ترسویی

**faintly** /ˈfeɪntli/ *adverb*

تاکەمێ، کەمێ، بری: *He looked faintly embarrassed* ◌ تا حدی

**faintness** /ˈfeɪntnəs/ *noun*

1 لاوازی، کزی، سستی، داماوی 2 کەمی ◌ 1 ضعف 2 ناچیزی

**fair¹** /feə(r), US fer/ *adjective, noun*

*adj* 1 بەداد، دادپەروەر، دادمەند، دروست 2 دادوەرانە، دادگەرانە، خودایی، لەرووی ئینسافەوە 3 بێغەرەز، بێلایەن، لانەگر، بێشێلەوبێلە، بێفروفێڵ 4 بەرحەق، ڕەوا، قانوونی 5 مامناوەندی، ئەندازە، دەستە، تا ئەندازەیێ باش 6 جێی هیوا 7 زۆر، زەبەند، بەرچاو، جێی سەرنج 8 بێعەیب، بێگەرد، بێخەوش، بێلکە 9 (هەوا) خۆش، سازگار، ساو، بێهەور 10 کاڵ (قژ) 11 خاوێن، تەمیز 12 (کۆن) جوان، ڕند، چەلەنگ 13 (ئەوسترالیا) تەواو *n* شتی باش یا جوان ◌ *adj* 1 منصف، عادل 2 منصفانە 3 بی‌طرف، بی‌تزویر 4 مجاز 5 نسبتاً خوب، متوسط 6 امیدبخش 7 بسیار، معتنابه 8 بی‌عیب 9 مساعد 10 بور (مو) 11 تمیز 12 زیبا 13 کامل *n* چیز خوب

**fair²** /feə(r), US fer/ *adverb*

1 دادگەرانە، دادپەروەرانە، بێفروفێڵ 2 باش، دروست، ڕاستەوخۆ ◌ 1 منصفانە، بدون تزویر 2 خوب، مستقیم

**fair³** /feə(r), US fer/ *noun*

1 بازاڕ 2 پێشانگا (گەورە، کەڵوپەلی پیشەسازی و بازرگانی) ◌ 1 بازار 2 نمایشگاه

**fair copy** *noun*

پاکنووس ◌ پاکنویس

**fair dinkum** *noun*

ڕاستەقینە، ڕاستی ◌ واقعی، حقیقت

**fair game** *noun*

گاڵتەجاڕ، مایەی سەرکۆنە یان گاڵتەپێکردن ◌ مضحکه، مایەی تمسخر

**fairground** /ˈfeəgraʊnd, US ˈferg-/ *noun*

1 شوێنی کایە یا یاری 2 شوێنی پێشانگا ◌ 1 شهر بازی 2 محل نمایشگاه

**fair-haired** /ˌfeəˈheəd/ *adjective*

قژکاڵ، مووزەرد ◌ بور

**fair-haired hyacinth** *noun*

قالاوخۆر؟، گۆڕاڵەمووسایانی؟ [ *Muscari Comosum* ] ◌ کلاغک پری

**fairies' bonnets** *noun, pl.*

جۆری کارگەگوڵانەی چکۆلە، کڵاوەکەی شنووەی قامکەوانە thimble دەدا [ *Coprinus disseminatus* ] ◌ نوعی قارچ سمی کوچک

**fairily** *adverb*

بەریئاسا، پەرییانە ◌ پری‌مانند

**fairing¹** /ˈfeərɪŋ/ *noun*

بایر (لە ماشێن، فڕۆکە و گەمیدا) ◌ بادشکن

**fairing²** /ˈfeərɪŋ/ *noun*

دیاری پێشانگا fair ◌ فیرینگ

**fairish** /ˈfeərɪʃ/ *adjective*

تا ئەندازەیێ باش، تا ڕادەیێ باش، کەمێ باش، مامناوەند، ئەندازە: *a fairish wage for those days* ◌ نسبتاً خوب (fairishly /ˈfeərɪʃli/ *adv*)

**fairly** /ˈfeəli, US ˈferli/ *adverb*

1 تا ئەندازەیێ، تا ڕادەیێ، کەمتاکورتێ، بەحاڵ 2 دادپەروەرانە، پیاوانە، دروست، دادگەرانە، لانەگرانە ◌ 1 نسبتاً 2 منصفانە

**fair-minded** /ˌfeəˈmaɪndɪd/ *adjective*
1 دادپەروەر، دادگەر، بەداد، بەویژدان، بێغەرەز، لانەگر، بێ‌لایەن 2 بێ‌لایەنانە، دادپەروەرانە ۞ 1 منصف، بی‌غرض 2 عادلانە

**fairness** /ˈfeənəs, US ˈfernəs/ *noun*
1 دادپەروەری، داد، دادگەری، دادمەندی، پیاوەتی، ویژدان، جوامێری، بێ‌لایەنی، لانەگری، بێ‌غەرەزی 2 ڕەنگی کاڵ 3 جوانی، ڕندی 4 سپێتی، سپی‌بوون (پێست) ۞ 1 انصاف، مروت، بی‌غرضی 2 رنگ بور 3 زیبایی 4 سفیدی

**fair play** *noun*
1 دادپەروەری، داد، دادگەری، پیاوەتی، ویژدان، بێ‌لایەنی، لانەگری، بێ‌غەرەزی 2 کایە یان یاری بێ‌فروفێڵ، یاری پیاوانە ۞ 1 انصاف، مروت، بی‌غرضی 2 بازی بدون شیلە و پیلە

**fair sex** *noun*
ژن، ژنان (لەگەڵ the ش دێ) ۞ جنس لطیف

**fair-spoken** /ˌfeəˈspəʊkn/ *adjective*
نەرم، نەرمونیان، بەحەیا، بەڕەوشت: *a fair-spoken youth* ۞ ملایم، باادب

**fair-to-middling** *adjective*
تا ئەندازەیێ باش، تا ڕادەیێ باش، برێ باش ۞ نسبتاً خوب

**fair trade** *noun*
کاسپی حەڵاڵ، کاروباری ڕەوا یان حەڵاڵ، کاری لە ڕووی ویژدانەوە ۞ تجارت مشروع

**fairway** /ˈfeəweɪ, US ˈferweɪ/ *noun*
1 کەشتی‌یەڕێ، کەشتی‌ڕێ، کەشتی‌ڕەو 2 بەشێ لە دەریا لە تەنیشت فڕۆکەخانە، فڕۆکە دەریایی‌یەکان لەوێ دەفڕن یان هەڵدەستن 3 (مەیدانی گۆلف) بەشی چیمەن لێ‌کراو (یان چیمەن‌کورت، نێوان دار و سەوزایی) ۞ 1 کانال قابل کشتی‌رانی 2 فیروی 3 قسمت چمن‌کاری‌شدە

**fair-weather** /ˈfeəweðə(r)/ *adjective*
بێ‌ئەمەک، نیوەڕێ، بێ‌وەفا ۞ بی‌وفا

**fair-weather friend** *noun*
دۆستی نیوەڕێ ۞ دوست بی‌وفا

**fairy** /ˈfeəri/ *noun* (*pl.* fairies), *adjective*
1 *n* پەری: *a good/wicked fairy* 2 هۆمۆسێکشواڵ (پیاو)، پوشت، کوونی، قوندەر 3 جۆرێ hummingbird ی کلک‌درێژی ئەمریکای باشووری و ناوەندی [توخم *Heliothryx*: دوو جۆرن] *adj* پەری‌ئاسا، وەکوو پەری ۞ 1 *n* پری 2 هوموسکشوال 3 نوعی پرندە *adj* پری‌وار

**fairy armadillo** *noun*
جۆرێ ئارمادیلۆی زۆر چکۆلەی ڕەهۆڵ‌کەنی burrowing خوارووی یان باشووری ئەمریکای باشووری [توخم *Clamyphorus*: دوو جۆرن] ۞ نوعی آرمادیلو

**fairy cake** *noun*, also cup cake
(بریتانیا) کەیکی پیاڵەیی: جۆرێ ئیسفەنجی یەک‌کەسی ۞ کیک یزدی

**fairy floss** = candy-floss

**fairy godmother** *noun*
فریشتەی ڕزگاری، پەری نەجات، یارمەتیدەر، پەری بەدەنگەوەهاتوو ۞ فرشتەی نجات

**fairyland** /ˈfeərilænd, US ˈferi-/ *noun*
1 وڵاتی پەری‌یان، پەریستان، پەریلەند، پەری‌نشین 2 شوێنی جوان و خۆش، بەهەشت: *The toyshop is a fairyland for young children* ۞ 1 سرزمین پریان 2 بهشت

**fairy lights** *noun, pl.*
گڵۆپە ڕەنگی‌یەکان، چرای ڕەنگی (بۆ جوانی، ب.ت. لەسەر دار بۆ کریسمەس) ۞ لامپ‌های رنگی

**fairylike** /ˈfeərilaɪk/ *adjective*
پەری‌ئاسا، شێوەپەری ۞ پری‌مانند، پری‌وش

**fairy ring** *noun*
بازنە یان ئاڵقەی جادوویی، ئاڵقەپەری‌یانە، ئاڵقەی کارگ: 1 ئاڵقەیێکی کارگە basidiomycetous ەکان کە لە دەوروبەری mycelium دێتەبەرهەم 2 کارگێ کە زۆرتر لە (ناوچەی) بازنە یا ئاڵقەی جادوویی‌دا شین دەبێ [ب.ت. *Marasmius oreades*] ۞ حلقەی ساحرە

**fairy shrimp** *noun*
جۆرێ پێستڕەقی branchiopod ی ڕوونی چکۆلە کە زۆرتر لەسەر پشتی مەلە دەکا [دەستە Anostraca: زۆر جۆرن] ۞ فیری شریمپ

**fairy tale** /ˈfeəri teɪl/ *noun*, also fairy story
1 چیرۆک یان داستانی پەری‌یەکان 2 چیرۆکی هەڵبەستە، قسەی پڕوپووچ، درۆ کەڵەکەکردن ۞ 1 قصەی پریان 2 داستان دروغین

**fairy-tale** *adjective*
خەیاڵی، ئەفسانەیی ۞ تخیلی، رؤیایی

**fait accompli** /ˌfeɪt əˈkɒmpli, US ɔˈkɑːm-/ French fɛt akɔ̃pli/ *noun*, usually sing.] (*pl.* faits accomplis ˌfeɪz əˈkɒmpliː, US əˈkɑːm-/
کاری کراو، شتێکی کراو ۞ امر واقع‌شدە

**faith** /feɪθ/ *noun*
1 باوەڕ، بڕوا 2 دین، ئۆل، ئایین 3 وەفاداری، ئەمەگ، بەئەمەکی 4 باوەڕی، ڕاپێنین 5 بەڵێنی، پەیمان، سۆز، گفت 6 نیاز، خەیاڵ ۞ 1 اعتقاد، ایمان 2 دین 3 وفاداری 4 اعتماد 5 عهد، قول 6 نیت، قصد

**faithful** /ˈfeɪθfl/ *adjective, noun*
1 *adj* بەوەفا، بەئەمەک، ئەمەگ‌دار، پێزان، سەرڕاست، دڵسۆز، یەکلا 2 سەرڕاستانە 3 جێی ڕاپێنین، جێی‌باوەڕ 4 بەدین، دیندار، بەبڕوا، بەباوەڕ 5 لایەنگر، پشتیوان 6 لێ‌ڕاپێنراو، دروست، ڕاست، ڕاستەقینە، پشت‌پێبەستراو، باوەڕپێکراو: *a faithful copy* n ( the

faithful) 1 بــاوەڕداران، خــاوەنبــاوەڕان، ئیمانـداران، بـەدینان 2 بـڕواداران، لایـەنگران، ئالیگران، پشتیوانان ◌ adj 1 باوفـا، صـادق 2 صادقانه 3 قابل اعتماد 4 مؤمن 5 طرفدار 6 معتبـر، صحیح n 1 مؤمنین 2 طرفداران

**faithfully** /ˈfeɪθfəli/ *adverb*
سەرڕاستانە، دروست ◌ صادقانە، دقیقاً

**faithfulness** *noun*
1 بـەوەفایی، بەئەمـەکی، پێـزانی، ئـەمـەگداری، دڵسـۆزی، یەکلایی 2 بڕوا، ئیمـان ◌ 1 وفـاداری 2 ایمان

**faith-healer** *noun*
باوەڕمەند بە چارەسەرکردن بە ڕێگای نوێژ و نزا و هێزی بـاوەڕەوە، بـاوەڕتیمـار، باوەڕچارەسـەر ◌ اعتقاددرمان

**faith-healing** *noun*, also faith-cure
چارەسـەرکردن بـە ڕێگـای نـوێژ و نـزا و هێـزی بـاوەڕەوە، بـاوەڕتیمـاری، باوەڕچارەسـەری ◌ اعتقاددرمانی

**faithless** /ˈfeɪθləs/ *adjective*
1 بێوەفا، بێئەمەک، پێنەزان، خایین، بێبەڵێن، پـەیمانشـکێن، disloyal، treacherous: a *faithless servant* 2 بێدین، بێئیمـان، بێبڕوا، بـێبـاوەڕ 3 بـێبـاوەڕ، لـێنەزانـەبینراو، پشتپێنەبەستراو، باوەڕپێنەکراو ◌ 1 بـیوفـا، عهدشکن 2 بیدین 3 غیرقابل اعتماد

**faithlessly** /ˈfeɪθləsli/ *adverb*
پەیمانشکێنانە، بێبەڵێنانە، خەیانەتکارانە، لە ڕووی بـێوەفـایی یـان بـێئەمـەکییـەوە ◌ عهدشکنانه، از روی بیوفایی

**faithlessness** /ˈfeɪθləsnəs/ *noun*
1 بـێوەفـایی، نایـەکلایی، بـێئەمـەکی، خەیانـەت(کـاری)، پێنـەزانی، پـەیمانشـکێنی، بێبەڵێنی 2 بێباوەڕی، بێئیمانی، بێدینی ◌ 1 بیوفایی، عهدشکنی 2 بیاعتقادی

**fajitas** /fəˈhiːtəz, US fəˈdʒiːtəz/ *noun, pl.*
جۆرێ چێشتی مەکسیکی ◌ نوعی غذا

**fake**[1] /feɪk/ *noun, adjective*
*n* 1 شـتی قەڵـب 2 (شـت، بەڵـگە و هتـد)گزەتیـاکراو، سـاختە، هەڵبەسـتە، دەسـکرد، زڕ، نارەسەن 3 کەسێکی گزەون، فێڵەباز، دەسـبڕ *adj* قەڵب، نارەسەن، زڕ، ناڕاستەقینە، درۆ، فشە، ساختە، هەڵبەستە، خۆهەڵبەست: counterfeit: *a jacket in fake* ◊ *fake designer clothing* ◊ *fur* ◌ n 1 چیز بدلی 2 جعلی، بدل، ناسـره 3 آدم متقلب *adj* بدلی، جعلی، تقلبی

**fake**[2] /feɪk/ *adjedctive*
قەف، پێچ، ئاڵقە (تەناف، هەروەها flake) ◌ حلقه

**faked** *adjective*
ساختە، گزەتیاکراو، هەڵبەستە، خۆهەڵبەست، زڕ، فشە، درۆ، درۆزنە، قەڵب ◌ جعلی، تقلبی،
درۆغین

**faker** /feɪkə(r)/ *noun*
ساختەکار، ساختەساز ◌ جاعل

**fakir** /ˈfeɪkɪə(r), US fəˈkɪr/ *noun*
دەروێش، چلەکێش (لە "فەقیر"ی عەرەبییەوە) ◌ درویش، مرتاض

**fala** *noun*
فالا: گۆرانی بەکۆری سەدەکانی شازدە و حەڤدە ◌ فالا

**falafel** /fəˈlaf(ə)l, US -ˈlɑː-/ *noun*, also falafel, *pl.* falafel or falafel
جۆرێ چێشتی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست (بنەڕەت: لە "بیبار" عەرەبییەوە) *fulful, filfil* ◌ فلافل

**Falangism** /fəˈlandʒɪzəm/ *noun*
فالانژیزم ◌ فالانژیسم

**Falangist** /fəˈlandʒɪst/ *noun, adjective*
*n* فالانژیست (= ئەندامی پارتی ڕامیاری فاشیزم لە سپانیا دوای شەڕی 1936ـ1939) *adj* سـەربە فـالانژیزم یـان فالانژیسـتەکان ◌ n فالانژیسـت *adj* وابسته به فالانژیسم یا فالانژیستها

**Falasha** /fəˈlɑːʃə/ *noun, pl.* same or Falashas
ئەنـدامی کۆمەڵـێ لـە گـەلی ئـەتیۆپی کـە جوولەکـەن، جـووە ڕەشـەکان (بنـەڕەت: لـە Amharic ەوە "شاربەدەر، کۆچەر") ◌ فالاشا

**falcate** /ˈfalkeɪt/ *adjective*, also falcated
(گیانەوەرناسی و ڕووەکناسی) چەماوە، داسی، داسئاسا، شێوەداس، داسکی، قولاپی (بنەڕەت: لە *falcatus* لاتین، لە *falc-* ،*falx* "داس") ◌ هلالی

**falchion** /ˈfɔːl(t)ʃ(ə)n/ *noun*
(مێژوویی) فالچیۆن، فالشن، شمشێری چەماوەی کورتی دەمپان (بنەڕەت: *fauchon* ئینگلیسی نێوەڕاست، لە فەرەنسی کۆنەوە، لەسەر بنچینەی *falc-* ،*falx* لاتین "داس sickle") ◌ فالچیون

**falciform** /ˈfalsɪfɔːm/ *adjective*
(گیانەوەرناسـی و توێکـاری) داسئاسـا، شێوەداس، داسی، قولاپی، بە شێوەی scythe یان sickle ◌ داسمانند

**falciparum** /falˈsɪpərəm/ *noun*, also falciparum malaria
ئاستەمترین جۆری مالاریا، بە هۆی مشەخۆرێکی sporozoan بـە نـاوی *Plasmodium falciparum* تووش دەبێ ◌ فالسیپاروم

**falcon** /ˈfɔːlkən, US ˈfælkən/ *noun*
1 باز، سەقر، لاچین (تەوار مێیەکەیەتی) 2 جۆری تۆپی سووکی چکۆلەی کۆن کە لە سەدەی 15 ەوە تا 17 بەکاردێنرا (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ 1 باز 2 نوعی توپ قدیمی

**falconer** /ˈfɔːlkənə(r), US ˈfælkənər/ *noun*
بازەوان، بازپەرێن، بازڕاهێن ◌ بازدار

**falconet** /ˈfɔ:(l)k(ə)nɪt/ *noun*
1 (مێژوویی) جۆرێ تۆپی سووک 2 جۆرێ بازی چکۆلەی ئاسیای باشووری یان ئەمریکای باشووری 3 (بەپێی واتای وشەکە)بەچکەسەقر، بەچکەباز، بێچووەباز ◊ 1 و 2 فالکونت 3 بچەی باز

**falconry** /ˈfɔ:lkənri, US ˈfæl-/ *noun*
راو بە باز، بازەوانی، بازداری، بازڕاگری، باز بەخێوکردن، پەروەردەکردنی باز ◊ شکار با باز، پرورش باز

**falderol** /ˈfaldəral/ = folderol

**faldstool** /ˈfɔ:ldstu:l/ *noun*
1 کورسی نزمی نوێشتاو یان قەدکراو 2 جۆرێ مێزی دانوێشتاوی گەڕۆک بۆ چۆکدادانی نوێژکەر ◊ فالاستول

**fale** /ˈfɑ:leɪ/ *noun*
جۆرێ خانووی Samoan لائاوالە، بە بانی هەلاش پۆشەوە ◊ فالی

**fall** /fɔ:l/ *noun, adjective*
*n* 1 کەوتنەخواری، بەربوونەوە، کەوتن، گلان، بەعەرزاکەوتن، کەتن 2 کەمبوونەوە، دابەزین، شکان، داشکان، هاتنەخواری، نزمبوونەوە 3 بارین، بارشت، بڕی باریو، بارستەی بارشت: *a heavy fall of snow* 4 هەرەس هێنان، رووخان، هەرەمین، داتەپین، وەرگەڕان، گەرگەسان: *a rock fall* 5 لێژایی، لێژی توند، تەلان 6 پاییز، گەلاڕێزان، گرەژۆ، خەزەڵوەر، وەرین، وەرینان 7 (گیانەوەر) زایین، بوون، تەرەکین 8 (falls) ڕێژاو، هەلدێر، تاڤگە، سۆلاف، سوولاف (هاوواتای waterfall) *adj* پاییزە، پاییزی ◊ *n* 1 سقوط، عمل افتادن 2 کاهش، تنزل 3 بارش، مقدار بارش 4 فروپاشی، سقوط، ریزش 5 شیب 6 پاییز، برگ‌ریزان 7 زایش 8 (falls) آبشار *adj* پاییزە

**the Fall** /fɔ:l/ *noun*
بێ‌قسەیی ئادەم و حەوا لە خودا (کتێبی پیرۆز) ◊ هبوط آدم

**fallacious** /fəˈleɪʃəs/ *adjective*
1 لەسەربنچینەی هەڵە، لەسەرهەڵە بنچینەنراو، هەڵە، چەوت، چەواشەگەرانە: *a fallacious conclusion* 2 لەخشتەبەر، هەڵفریوێنەر، فریودەر، بەهەڵەدابەر، delusive ◊ 1 مغالطه‌آمیز، اشتباه 2 گمراه‌کننده

**fallaciously** /fəˈleɪʃəsli/ *adverb*
بەهەڵەدابەرانە، لەخشتەبەرانە ◊ به طور گمراه‌کننده

**fallaciousness** /fəˈleɪʃəsnɪs/ *noun*
1 لەسەربنچینەی هەڵەبوون، لەسەرهەڵە بنچینەنراوی، هەڵەیی، چەوتی 2 لەخشتەبەری، هەڵفریوێنەری، فریودەری، بەهەڵەدابەری ◊ 1 مغالطه‌آمیز بودن، اشتباه بودن 2 گمراه‌کنندگی

**fallacy** /ˈfæləsi/ *noun, pl.* fallacies
1 چەواشەگەری، راستی‌گۆڕی 2 هەڵە، باوەڕی نادروست یان بەدرۆ، باوەڕی هەڵە 3 بیرۆکەی چەوت یان هەڵە، بیرۆکەی بەهەڵەدابەر ◊ 1 مغالطه، سفسطه 2 اشتباه، عقیدەی نادرست یا دروغین 3 تصور غلط

**fallback** /ˈfɔ:lbæk/ *noun*
1 کەمبوونەوە، کەمکردنەوە، داشکاندن، هاتنەخوارەوە، دابەزین: *the fallback from an explosion* 2 پلانێکی جێگرەوە بۆ کاتی تەنگەتاوی: *We need a fallback position if they won't do the job* ◊ 1 کاهش 2 فالبک

**fallen**[1] /ˈfɔ:lən/ *adjective, noun*
*adj* 1 کەوتوو، بەرەوەبوو، کەوتووەخوار، بەعەرزداکەوتوو 2 وەریو، هەڵوەریو، داکەوتوو 3 کوشتە، مردوو، کوژراو (لە شەڕدا) 4 کاولبوو، خاپوورکراو، وێرانبوو 2 گیراو 6 بەهەڵەدابراو، ڕێ‌هەڵەکردوو، ڕێهەڵکردوو *n* (the fallen) کوژراوان، شەهیدانی شەڕ ◊ *adj* 1 افتاده 2 ریخته 3 کشته 4 ویران‌شده 5 مسخر 6 گمراه‌شده *n* کشته‌شدگان

**fallen**[2] /ˈfɔ:lən/ = past participle of fall

**fallen angel** *noun*
فریشتەی دەرکراو، شەیتان ◊ ملک مطرود

**faller** *noun*
(بریتانیا) گلاو، بەعەرزاکەوتوو (ب.ت. ئەسپی کە لە پێشبڕکێدا دەکەوێ) ◊ فالر

**fallen woman** *noun*
ژنێ کە کاری سێکسی لەگەڵ کەسێ کردووە کە مێردی پێ‌نەکردووە ◊ فالن وومن

**fallfish** *noun, pl.* same or fallfishes
جۆرێ ماسی ئاوە شیرینەکانی ئەمریکای باکووری، لە شێوەی chub [ *Semotilus corporalis* ] ◊ نوعی ماهی

**fall guy** *noun,* also scapegoat
(ئافەرمی) بەلاگێرەوە، قەزاوەگێر، قۆچی قوربانی، scapegoat: *a fall guy for his boss's errors* ◊ سپر بلا

**fallibility** /ˌfæləˈbɪləti/ *noun*
هەڵەکردن، لەهەڵەهاتوویی، هەڵەلەسەری، ئەگەری هەڵەکردن، هەڵفریواوی، لێ‌شێواوی ◊ خطاپذیری، جایزالخطا بودن

**fallible** /ˈfæləbl/ *adjective*
هەڵەکار، هەڵەلەسەر، لەهەڵەهاتوو، هەڵەکردوو، هەڵفریواو، لێ‌شێواو: *a -llible generalization* ◊ *we're all fallible* ◊ جایزالخطا، خطاپذیر

**fallibly** /ˈfæləbli/ *adverb*
هەڵەکارانە، هەڵەلەسەرانە، لەهەڵەهاتووانە ◊ به طور جایزالخطا

**falling** /ˌfɔ:lɪŋ/ *adjective, noun*
*adj* داکەوتوو، بەرەوەبوو، بەربووەوە، کەوتوو *n* کەوتنەخواری، بەربوونەوە ◊ *adj* سقوط‌کننده، افتان *n* سقوط

**falling-out** = quarrel

**falling star** = meteor or shooting star

**fall-off** *noun, BrE* also less frequent falling-off

کەمبوونەوە، داکەوتن، داشکان، شکان، دابەزین، نزمبوونەوە، هاتنەخواری: *a recent fall-off in sales* ۞ کاهش، نزول

**Fallopian tube** /fə͵ləʊpiən 'tju:b, US fə'loʊpiən tu:b/ *noun*

تووەڕێ، لوولە یان بۆری منالّدان، منالّدانەڕێ (بنەڕەت: لە *Fallopius* شێوەی لاتینیکراوی ناوی Gabriello *Fallopio*، توێکاری ئیتالیایی کە بۆ یەکەم جار باسی ئەم شتەی کرد) ۞ لولەی رحم

**fallout** /'fɔ:laʊt/ *noun*

1 بارین یان بارشتی تیشکە چالاکەکان (رادیۆئەکتیف)، تۆز و گەردی رادیۆئەکتیف (لە تەقینەوەی ناوکیدا) 2 ئەنجامی خراپ: *the political fallout of the current crisis* ۞ 1 فالّوت 2 نتیجەی بد

**fallout shelter** *noun*

پەناگە یا پەریزەی هێرشی ناوکی ۞ پناهگاه فالوت

**fallow**[1] /'fæləʊ, US -loʊ/ *adjective, noun*

1 *adj* شێوەرد، بەیار، شێو (زەوی)، باون، شێوبراو: *Farmers are now paid to let their land lie fallow* 2 ناچالاک، بۆنگخواردوو، *a* inactive, dormant *fallow period*: *Contemporary dance is coming onto the arts scene again after a long fallow period* 3 (مالۆسی) ناناوس *n* زەوی شێوەرد یان شێوبراو، بەیار، زەوی باون (fallowness *n*) ۞ *adj* 1 آیش 2 راکد 3 (مادەخوک) ناآبستن *n* زمین آیش

**fallow**[2] /'fæləʊ, US -loʊ/ *noun*

زەرد (ڕەنگ)، زەردی مەیلەوسوور، زەردی کالّ ۞ زرد (کمرنگ)

**fallow deer** *noun*

ناسکەزەردە، گاکێوی زەرد یان خەنەیی، لە هاویندا کەوڵ یا پێستی دەبێتە قاوەیی سوورباوی خالّسپی [*Cervus dama*] ۞ گوزن حنایی

**false** /fɔ:ls/ *adjective*

1 هەڵە، نادروست، لێشێوان، بەهەڵە، لێتێکچوون، چەوت، شاشی، ناراست 2 درۆ، بەدرۆ، ناسروشتی، درۆزنە، نارەسەن، زڕ، پیارە، دەسکرد، ناخۆیی 3 ساختە، لاهیە، دەسکرد، عەمەلی، قەلب 4 درۆزن، فرەک 5 لێشێواو، لێتێکچوو، بەهەڵەگیراو 6 خۆهەڵبەست، هەڵبەستە، لەخۆوە، بێهوودە، بێ دەلیل 7 نارەوا، ناقانوونی، ناحەق، ڕێگەنەدراو 8 کاتی، کورتماوە، نابەردەوام، بێدەوام 9 بەهەڵەدابەر، هەڵفریوێنەر، لەخشتەبەر 10 فێلّباز، دەسبڕ، بەفێلّوتەلّەک 11 خاین، ناپاک، بێوەفا، بێچاوڕوو، جەفاکار، بێئەمەک 12 (لە ناوناندا) شێوە ۞ 1 غلط، اشتباه 2 دروغی، کاذب، ساختگی، عاریتی، تصنعی، غیرطبیعی 3 تقلبی، مصنوعی، جعلی 4 دروغگو 5 اشتباهی 6 بیدلیل، بیهوده 7 غیرمجاز، ناحق 8 موقتی 9 گمراەکنندە 10 شیاد 11 خائن 12 شبه

**false acacia** *noun*

ئەکاکیا درۆزنە [*Robinia pseudoacacia*] ۞ نوعی آقاقیا

**false alarm** *noun*

1 لووره یان ئاژیری بەهەڵە، لووڕەدرۆزنە، زەرەئاژیر 2 ئاگادارکردنەوە یان ترسی لەخۆوە، هوژداری بەهەڵە ۞ 1 آژیر غلط 2 اخطار بیمورد

**false arch** *noun*

تاقئاسا، ساتاق، کەوانەئاسا، تاقەدرۆزنە ۞ قوسواره

**false arrest** *noun*

گرتنی لەخۆوە، دەسبەسەری بەهەڵە یان نابەجێ، گلدانەوەی ناقانوونی ۞ بازداشت اشتباهی، توقیف غیرقانونی

**false down** *noun*

ڕەوشی بەدرۆ، گورگ و مەڕ (کە پێتوایە بە باری باشیدا دەکەوێ بەلّام نا) ۞ وضع دروغین

**false-faced** /fɔ:lsfeɪsd/ *adjective*

خاین، ناپاک، بێوەفا، درۆلەگەڵکردوو ۞ خائن

**false friend** *noun*

ڕفێق یان دۆستی بەدرۆ ۞ دوست دروغین

**false fruit** *noun*, also pseudocarp

زڕکەمیوە، زڕەبەر، میوەدرۆزنە، بەرەدرۆزنە ۞ فلس فروت

**false-hearted** /fɔ:lshɑ:tɪd/ *adjective*

خاین، ناپاک، بێوەفا، جەفاکار، درۆلەگەڵکردوو ۞ خائن، بیوفا

**falsehood** /'fɔ:lshʊd/ *noun*

درۆ، فڕا، هەڵبەست، درۆکردن، درۆزنی، نادروستی، ناراستی، ڕاستنەبوون ۞ کذب، دروغگویی، دروغ، عدم صحت

**false imprisonment** *noun*

(ماف) گرتن یان زیندانیکردنی ناقانوونی، تاوانی ڕاگرتنی ناقانوونی ۞ حبس غیرقانونی

**falsely** /'fɔ:lsli *adverb*

بە درۆ، ڕیاکارانە، ڕووبینانە، بەهەڵە: *She smiled falsely at his joke* ۞ متظاهرانە، بە دروغ، اشتباهاً

**false memory** *noun*

(دەروونناسی) یادەوەری درۆ یان ناراست (نەبووە) ۞ حافظەی کاذب

**false move** *noun*

کردەوەی نادروست یان بێجێ، جوولانەوەی نابەجێ ۞ اقدام نادرست

**falseness** /'fɔːlsnəs/ *noun*
1 درۆ(بوون)، نادروستی، ناراستی، قرابوون 2 ناپاکی، خەیانەت ◌ 1 كذب، عدم صحت 2 خيانت
**false pretences** *noun, pl.*
هەڵفریواندن، فریودان، دەسبڕی ◌ شیادی، فریب‌کاری
**false rib** = floating rib
**false scorpion** *noun*
زرکەجالجالووکە، جالجالووکەدرۆزنە، نیمچەجالجالووکە، بێزگی درێژ و چزوو [دەستە Pseudoscorpiones] ◌ شبه عنکبوت
**false Solomon's seal** *noun,* also false Solomonseal
زرکەهەزارگری، هەزارگریدرۆزنە، لە تیرەی زەمبەق lily [توخم *Smilacina*] ◌ نوعی گیاه
**false start** *noun*
1 (لە پێشبرکێدا) دەسپێکی بەهەڵە 2 سەرەتای نابەجێ یان بێجێ، دەسپێکی نابەجێ ◌ 1 آغاز غلط 2 شروع نابجا
**false step** *noun*
1 لێهەڵقلیشان، هەڵخلیسکان، لێشێوان 2 هەڵە ◌ 1 لغزش 2 اشتباه
**false teeth** *noun*
ددانی عەمەلی، ددانی دەسکرد ◌ دندان مصنوعی
**false topaz** = citrine
**falsetto** /fɔːl'setəʊ, US -toʊ/ *noun, pl.* falsettos
زەنگولی، دەنگی هەرەناسک یان یەکجار تیژ، زەنگولی؛ گۆرانیبێژی ئەو دەنگە ◌ فالستو
**false witness** *noun*
شایەدی (بە)درۆ ◌ شهادت دروغ
**falsework** *noun*
چوارچێوەی کاتی: بۆ ڕاگرتنی خانوو لە ماوەی سازکردنیدا ◌ حایل موقت
**falsies** /'fɔːlsiz/ *noun, pl.*
(نافەرمی) مەمکی دەسکرد، زرمەمک، نیمتەنەی مەمک ◌ پستان مصنوعی
**falsifability** *noun*
هەڵەکردن، لەهەڵەهاتوویی، هەڵەلەسەری، ئەگەری هەڵەکردن، هەڵفریواوی، لێشێواوی ◌ خطاپذیری، جایزالخطا بودن
**falsifible** *adjective*
هەڵەکار، هەڵەلەسەر، لەهەڵەهاتوو، هەڵەکردوو، هەڵفریواو، لێشێواو ◌ جایزالخطا، خطاپذیر
**falsification** /ˌfɔːlsɪfɪ'keɪʃn/ *noun*
1 دەسکاری، فێڵ‌تیاکردن، گزەتیاکردن، ساختەکاری، ڕاستیگۆڕی، گزەوونی: *the deliberate falsification of the company's records* 2 بەدرۆخستنەوە، پووچەڵکردنەوە 3 شێواندن، رووشاندن، چەواشەکردن، دەسکاری(کردن) 4 ریاییبازی، دووڕوویی ◌ 1 جعل، تقلب 2 تکذیب، ابطال 3 تحریف 4 تزویر
**falsifier** *noun,* also falsificator
1 دەسکاریکەر، ساختەکار، ڕاستیگۆڕ، شێوێنەر، چەواشەکار 2 ریاییباز، فێڵەباز ◌ 1 جاعل، تحریف‌کننده 2 مزور
**falsity** /'fɔːlsəti/ *noun, pl.* falsities
1 درۆ، ناراست‌بوون، نادروستی، هەڵەبوون، هەڵە، شاشی، چەوتی 2 ناپاکی، خەیانەت ◌ 1 کذب، سقم، اشتباه 2 خیانت
**Falstaffian** /fɔːl'stɑːfɪən, US fɔːl'stæːfɪən/ *noun*
لە شێوەی قارەمان و کەسایەتی شەکسپیەر لە *Henry IV* و *Merry Wives of Windsor* دا، سێر جان فالستاف، شاد و زۆرخۆر و زۆرخۆرەوە: *My uncle was a Falstaffian figure* ◌ فالستافی
**faltering** /'fɔːltərɪŋ/ *adjective*
دڕدۆنگاوی، دڕدۆنگییانە، لەگەڵ دوودڵی ◌ تردیدآمیز
**falteringly** /'fɔːltərɪŋli/ *adverb*
بە شێوەیەکی دڕدۆنگییانە، دوودڵانە ◌ به طور تردیدآمیز
**fame** /feɪm/ *noun*
ناو، دەنگ، ناوبانگ، ئاوازە، ناف‌ودەنگ، نێوبەدەرەوەیی: *to achieve/win instant fame* ◌ آوازه، شهرت
**famed** /feɪmd/ *adjective*
بەناوبانگ، پڕئاوازە، نێوبەدەرەوە، ناسراو، بەنامیە: *a famed poet and musician* ◌ مشهور، پرآوازه
**femeless** *adjective*
نەناسراو، بێناو ◌ بی‌شهرت
**familial** /fə'mɪliəl/ *adjective*
1 خێزانی، بنەماڵەیی، ماڵباتی: *familial left-handedness* 2 *a familial disorder* ◊ ڕەچەڵەکی، سەربە بنەچەک ◌ 1 خانوادگی 2 وابسته به تبار
**familial adenomatous polyposis** *noun,* also familial polyposis
جۆرێ نەخۆشی بۆماوەیی لە ریخۆڵە گەورەدا کە لەودا ب.ت. لە کۆلۆن و کۆمدا rectum ژمارەیێ پڕیا یان پۆلیپی لوویی glandular پێکدێ کە دەتوانێ ببێتە مەترسیدار (ئەگەر چارەسەر نەکرێ) ◌ نوعی بیماری
**familiar** /fə'mɪliə(r)/ *adjective*
1 ئاشنا، ناسیاو، رووکراوە، ئاگادار، بەڵەد، شارەزا 2 ناسراو، هۆگر، راهاتوو، ئاسایی، نزیک، گەرم‌وگوڕ، نافەرمی، دۆستانە، خۆمانە 3 ماڵی، خانەکی 4 ئاشنا، شناس، ناسیاو، دۆست، نزیک ◌ 1 آشنا، مطلع 2 شناخته‌شده، عادی، مأنوس، صمیمی 3 اهلی 4 آشنا، محرم

**familiarity** /fəˌmɪli'ærəti/ *noun, pl.* familiarities
1 ناسیاوی، ئاشنایی، شناسی، رووکرانەوە، ئاگاداری 2 زانین، ناسین، هۆگری، راهاتوویی، سیوا، سەوازۆبوونەوە 3 رەفتار یان هەڵسوکەوتی دۆستانە 4 ( familiarities /fəˌmɪli'ærəti/) هەڵسوکەوتی خۆمانەیی یان نەفەرمی ◇ 1 آشنایی، اطلاع 2 شناخت 3 رفتار خودمانی 4 (در جمع) رفتار غیررسمی

**familiarization** /fəˌmɪliəraɪ'zeɪʃn, US -rə'z-/ *noun*
1 ناسیاوی، شناسی، راهاتوویی 2 ناسیاوکردن، راهێنان، ئاشناکردن، پێناساندن، پێناسین، فێرکردن، روو(پێ)کردنەوە، سەوازۆکردنەوە ◇ 1 آشنایی 2 آشناسازی

**familiarly** /fə'mɪliəli, US -ərli/ *adverb*
دۆستانە، خۆمانە، گەرموگورانە: *He touched her cheek familirly* ◇ دوستانە، بدون تکلف، بی‌رودربایستی

**familist** /'famɪlɪst/ *adjective*
فامیلیست: سەربە چوارچێوەی کۆمەڵایەتی لەسەر بنچینەی پێوەندی خێزانی ◇ فامیلیست

**family** /'fæməli/ *noun* (*pl.* families), *adjective*
*n* 1 خاو و خێزان، ژن‌ومناڵ، خێزان، وەجاخ، بنەماڵە، ماڵبات، ئەندامانی ماڵەوە، خێزانی ماڵەوە، نانخۆر، مناڵان، عەولاد 2 خێزان، ماڵبات (سەرەرای واتای ناوەندی خۆی، کۆمەڵێ لە شتەکان (ب.ت. زمان) کە تایبەتمەندی‌یەکی هاوبەش یان یەک سەرچاوەیان هەبێ) 3 تایەفە، تیرە، خێڵ، هۆز 4 بەرە، دوودمان، رەچەڵەک، بن‌وبنەچەک، بنەچەک، خانەدان 5 خزم، کەس‌وکار، قەوم 6 (زیندەناسی، لە پۆلاندنا) خێزان، تیرە (لەژوور genus و لەژێر order) *adj* سەربە خێزان ◇ *n* 1 خانوادە، اعضای خانوادە، بچەها 2 خانوادە 3 طایفە، قبیلە 4 دودمان، تبار 5 خویشاوند 6 (زیست‌شناسی) خانوادە *adj* وابستە بە خانوادە

**family allowance** *noun*
مافی مناڵان یان عەولاد ◇ حق اولاد

**family circle** *noun*
کۆڕی خاو و خێزان ◇ محفل خانوادگی

**family doctor** *noun*
نۆژدار یان دوکتوری خاو و خێزان ◇ پزشک خانوادە

**family likeness** *noun*
لێکچوون، لێک‌کردن (لە نێوان ئەندامانی خاو و خێزاندا) ◇ شباهت

**family man** *noun*
پیاوی خێزان‌دار، پیاوی ژن و مناڵدار، خێزان‌دار ◇ عیالوار

**family name** *noun*
دوانێو، پاشناو، نێوی خێزانی ◇ نام خانوادگی

**family planning** *noun*
کۆنترۆڵی خاو و خێزان، میزان یان رێک‌کردنی خاو و خێزان: *to make an appointment at the family planning clinic* ◇ کنترل خانوادە

**family room** *noun*
دیوی دانیشتن، ژووری نیشتمان ◇ اتاق نشیمن

**family tree** *noun*
رەچەڵەک‌نامە: *How far back can you trace your family tree?* ◇ شجره(نامه)

**famine** /'fæmɪn/ *noun*
1 قاتی‌وقڕی، قاتی، وشکەساڵی، گرانی، کەمی، کێماسی، دەگمەنی: *a severe famine* ◊ 2 *disasters such as floods and famine* ◊ 1 (کۆن) برسێتی، برچی‌بوون، starvation ◇ 1 قحطی، کم‌یابی 2 گرسنگی

**famished** /'fæmɪʃt/ *adjective*
(ئافەرمی) برسی، لەبرسا مردوو، starving: *famished refugees* ◇ گرسنه، هلاک از گرسنگی

**famous** /'feɪməs/ *adjective*
1 ناسراو، بەناوبانگ، سەربەدەرەوە، ناودار، بەناو، پێش‌چاو، بەنامیە، بەناویە: *a famous artist/hotel* 2 گەورە، بەشکۆ، بەرز ◇ 1 مشهور، بنام، پرآوازه 2 عالی

**famously** /'feɪməsli/ *adverb*
بەرز، یەکجار باش: *the words he famously uttered on his deathbed* ◇ عالی

**famulus** /'famjʊləs/ *noun, pl.* famuli /-lʌɪ, -li:/
(مێژوویی) شاگرد، بەردەست، نۆکەر، کارەکەر (ب.ت. هی جادووگەر یان زانیاری؛ بنەرەت: لە لاتینەوە بە واتای "servant") ◇ نوکر، شاگرد

**Fan** /fan/ = Fang

**fan**[1] /fæn/ *noun*
1 باوەشێن، واشەمەک، هێرکوڵ، پانکە، باوەشێنی ئێلیکتریکی، هەواکێش 2 پەروانە، پەرە، فەن، ئامرازی فێنک‌کەرەوە (یان فێنک‌کردنەوە) 3 (بۆقلە، تاووس و...) چەتر ◇ 1 بادبزن، پنکه 2 پروانه، فن 3 چتر

**fan**[2] /fæn/ *noun*
لایەنگر، کوشتەومردە، سەوداسەر، بەپەرۆش ◇ طرفدار، مشتاق

**Fanakalo** /ˌfanaga'lɒ, US 'fanagalɒ/ *noun*, also Fanagalo
زمانێکی پەرەسەندوو وەکوو زمانێکی هاوبەش لە لایەن کۆمپانی‌یەکانی باشوورنشینانی ئەفریکاوە، لە تێوخمی زمانەکانی Nguni ئینگلیسی و Afrikaans پێکهاتووە ◇ فاناکالو

**fanatic** /fə'nætɪk/ *noun, adjective*
*n* 1 مرۆی دەمارگرژ یان توندڕەو، مرۆی پەرگر:

2 a fitness/crossword, etc. fanatic لایەنگر (دەمارگرژ، ب.ت. دین یان رامیاری) adj دەمارگرژ، دەمارگیر، تونرەو، پەرگر، چەقبەستوو، دەمارگرژانە ◌ n 1 شخص افراطی یا متعصب 2 طرفدار adj متعصب، جزمی، تعصب‌آمیز

**fanatical** /fəˈnætɪkl/ *adjective*

دەمارگرژ، دەمارگیر، تونرەو، چەقبەستوو: a fanatical ◊ fanatical anti-royalists supporter ◌ متعصب، متحجر

**fanatically** /fəˈnætɪkli/ *adverb*

دەمارگرژانە: fanatically fit ◌ متعصبانه

**fanaticism** /fəˈnætɪsɪzəm/ *noun*

دەمارگرژی، چەقبەستوویی، تونرەوی: driven by religious fanaticism ◌ تعصب، تحجر

**fan belt** *noun*

تاسمەی پەرە، تەسمە یان قایشی پەرە یان پەروانە ◌ تسمەی پروانه

**fancied** *adjective*

خەیالی، ئەندیشەیی ◌ خیالی

**fancier** /ˈfænsiə(r)/ *noun*

(ب.ت. لە لێکدانا) ـباز، ـوان، دۆست، خۆشەویست ◌ ـباز، دوست

**fanciful** /ˈfænsɪfl/ *adjective*

1 خەیالاتی، خەیالاوی، ناژیرانە، پڕوپووچ، بێبنچینە، خەیالی، ئەندیشەیی، لە راستی بەدوور: a fanciful person 2 سەیر، نائاسایی، بەزریقەوبریقە، بەئالاوواڵا ◌ 1 خیال‌پرداز، بی‌اساس، تخیلی 2 شگفت، پرزرق و برق

**fancifully** /-fəli/ *adverb*

خەیالاتی‌یانە، بە شێوەیەکی خەیالاتی ◌ خیال‌بافانه

**fancifulness** /ˈfænsɪflnəs/ *noun*

نائاسایی، بەلاجەوی، سەیربوون، خەیال، ئەندیشە ◌ شگفتی، وهم

**fan club** *noun*

یانەی لایەنگرانی دەمارگرژ یان بەپەرۆش ◌ باشگاه هواخواهان

**fancy** /ˈfænsi/ *noun* (*pl.* fancies), *adjective* (fancies, fancied)

n 1 خەیاڵکردنەوە، خەیاڵبردنەوە، هێنانەبەرچاو، وێناکردن، خەیاڵپلاو(کردن) 2 هێز یان توانایی خەیاڵکردنەوە 3 خەیاڵی پڕوپووچ 4 گومان، مەزندە، مەیل، کەلکەلە، خولیا، نگە، ئیشتیا، ئارەزوو، هەوا 5 هۆگری، دلبەستەیی 6 (هەروەها fancy cake) کەیک یان توشەی فانتزی 7 (fancies) کەیکی جوانی چکولانە، فانسیز adj 1 خەیالی، ئەندیشەیی، پڕوپووچ، لەراستی بەدوور 2 بۆ جوانی 3 سەیر، نائاسایی، سەیروسەمەرە 4 بە زریقەوبریقە، پرنەخش‌ونیگار، رەنگاورەنگ 5 یەکجار زۆر، یەکجار گران، یەکجار لەسەری (نرخ) ◌ n 1 خیال‌پردازی، تخیل، تصور 2 قوەی مخیله 3 پندار بیهوده 4 حدس، میل، هوس 5 دلبستگی 6 کیک یا بیسکویت فانتزی 7 فانسیز adj 1 موهوم، تخیلی 2 تزیینی 3 عجیب‌وغریب 4 پرزرق و برق 5 سرسام‌آور

**fancy dress** *noun*

بەرگی سەیر، جل‌وبەرگی نائاسایی (بۆ میوانی، کەرنەڤال، ئاهەنگی سەما و هەڵپەرکێ) ◌ لباس بالماسکه

**fancy-free** /ˌfænsɪˈfriː/ *noun*, footloose and fancy-free

ئازادی ئازاد، ئاسوودە، تەناهـ نادەربەست، بێ‌خەیال، بێ‌خەم، سەرسووک، لە حەوت دەوڵەت ئازاد ◌ فارغ‌البال، بی‌دغدغه

**fancy goods** *noun, pl.*

شت‌ومەک یان کەل‌وپەلی رازاندنەوە ◌ کالاهای لوکس

**fancy man** *noun*

1 گراو، یار، دۆست 2 سەرگر، گەواد ◌ 1 معشوق 2 دیوث

**fancy woman** *noun*

1 گراو، یار، دۆست 2 قەحبە، جندە، ژنی حیز، لەش‌فرۆش ◌ 1 معشوق 2 فاحشه

**fancywork** *noun*

گوڵدۆزی، ئۆیە، گوڵچنی، درووماني جوانی ◌ سوزن‌دوزی

**F and A** *abbreviation* fore and aft

**fandangle** /fanˈdaŋg(ə)l/ *noun*

شت‌ومەکی جوانی بازاڕی یان بێ‌خێرە ◌ چیز تزئینی بی‌ارزش

**fandango** /fænˈdæŋgəʊ, US -goʊ/ *noun*, *pl.* fandangoes or fandangos

1 فەندەنگۆ (سەما یان هەڵپەرکێی سپانیایی یان ئەمریکای باشووری) 2 هەڵسیت‌وپڵیت، حەلەق‌ومەلەق، قسەی هیچەکە 3 = fandangle ◌ 1 فاندانگو 2 مزخرف

**fane** /ˈfeɪn/ *noun*

(کۆن) پەرستگە، نزرگە، گۆڕ، گڵکۆ، چاک، کلێسە (بنەڕەت: لە fanum لاتینەوە) ◌ معبد، مقبره، ضریح، کلیسا

**fanfare** /ˈfænfeə(r), US -fer/ *noun*

1 فانفار (موسیقا، ب.ت. بە کەرەنا trumpet لێدەدرێ) 2 جەنجاڵی، دەنگەدەنگ، هەڵا، چرەوگورە ◌ 1 فانفار 2 هیاهو، سر و صدا

**fanfaron** *adjective*

خۆهەڵکێش، فروفیشاڵ‌کەر، فیشاڵچی ◌ لافزن

**fanfaronade** /ˌfanfarəˈneɪd, US -ˈnɑːd/ *noun*

1 خۆهەڵکێشان، فروفیشاڵ، لاف، هارەوگیفە 2 = fanfare ◌ لافزنی

**Fang** /faŋ/ *noun*, also Fan, *pl.* same or Fangs or Fans

1 فانگ (خەڵکی چەند بەشێ لە کامێروون، گینەی پشتینەیی و گابۆن 2 زمانی بانتۆیی Bantu ئەو گەلە ◌ فانگ

**fang** /fæŋ/ *noun*

1 کەڵبە، قیل، کەڵبە (سەگ، گورگ و هتد) 2 چزوو، کاڵەگ (مار) 3 ریشە یا چوکڵەی ددان، کولاب ◌ 1 دندان نیش 2 نیش 3 ریشەی دندان

**fango** /'faŋgəʊ/ *noun*

قوری کانیاوە گەرمەکانی ئیتالیا، بۆ چارەسەری ◌ فانگو

**fan heater** *noun*

کوورەی پانکەیی ◌ فن‌کوئل

**fan jet** = turbofan

**fanlight** /'fænlaɪt/ *noun*

خەفەنگ، دەلاقەی سەر درگا یان پەنجێرە(ی سەردرگا)، پەنجێرەی ژوور درگا، شووشەبەند ◌ خفنگ

**fan mail** *noun*

نامەی لایەنگران ◌ نامەی طرفداران

**fanny** /'fæni/ *noun, pl.* fannies

1 (لە ئەمریکا) کنگ، قوون 2 (لە بریتانیا) قوز، شەرم ◌ 1 کفل 2 کس

**fanny pack** = bumbag

**fan palm** *noun*

دارخورمای (گەڵا)باوەشێنی [*Chamaerops* و توخمەکانی تر، زۆر جۆرن] ◌ نوعی درخت خرما

**fantabulous** /fan'tabjʊləs/ *adjective*

1 (نافەرمی) یەکجار باش: *had a -ntabulous time* 2 سەیر ◌ 1 عالی 2 شگفت‌انگیز، عجیب

**fantail** /'fantail/ *noun*

1 کلکباوەشێنی، کلکچەتری 2 کوتری کلکباوەشێنی یان کلکباوەشێنە 3 بەشێکی شۆڕەوەبوو یان دەرپەڕیوی پاژنەی کەشتی شەڕکەر 4 (هەروەها fantail flycatcher) جۆرێ قولەچەقەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا و ئەوسترالیا، قولەچەقەی کلکباوەشێنی [توخم *Rhipidura*: گەلێ جۆرن] ◌ 1 دم چتری 2 کبوتر دم‌چتری 3 و 4 فنتایل

**fan-tan** /'fantan/ *noun*

1 جۆرێ قوماری چینی 2 جۆرێ کایەی پەڕین ◌ فانتان

**fantasia** /fæn'teɪziə/ *noun*

(موسیقا) فانتیزی، فانتزی ◌ فانتزی

**fantasm** = phantasm

**fantast** = visionary, also phantast

**fantastic** /fæn'tæstɪk/ *adjective*

1 سەیر 2 خەیاڵی، ئەندیشەیی، بێ‌ڕوپووچ 3 دوور لە راستی، ناکرداری 4 لوَدە، کۆما، یەکجار زۆر (پارە) 5 یەکجار گەورە، بێ‌داد، نائاسایی، سەراسا ◌ 1 شگفت 2 واهی، موهوم 3 غیرعملی 4 هنگفت 5 فوق‌العاده

**fantasticality** /fæntæstɪ'kælətɪ/ *noun*

سەیربوون، سەمەرەبوون ◌ غرابت

**fantastically** /fæn'tæstɪkli/ *adverb*

یەکجار باش: *a fantastically shaped piece of stone* ◌ بسیار عالی

**fantasticalness** *noun*

1 خەیاڵی بوون، ئەندیشەیی 2 سەیربوون ◌ 1 تخیلی بودن 2 غرابت

**fantasy** /'fæntəsi/ *noun, pl.* fantasies

1 خەیاڵکردنەوە، خەیاڵبردنەوە، ئەندیشەکردنەوە، پێ‌وابوون، وازانین، خەیاڵ 2 بەرهەمی خەیاڵکردنەوە 3 بیرۆکەی ناڕاستەقینە، بۆچوون یان باوەڕی لەسەر خەیاڵ بنچینەنراو، بۆچوونی ئەندیشەیی، باوەڕی خەیاڵی 4 (موسیقا) فانتزی fantasia ◌ 1 خیال‌پردازی، پندار 2 محصول تخیل، وهم 3 عقیده یا نظر غیرواقعی 4 فانتزی

**Fante** /'fanti/ *noun*, also Fanti, *pl.* same or Fantis

1 ئەندامی گەلێکی باشووری گانا 2 زاراوەی Akanی ئەو گەلە ◌ فانتی

**fantod** /'fantɒd/ *noun*

(نافەرمی، ئەمریکا) زۆر ◌ فشار

**fantom** /'fantəm/ = phantom

**fan vault** *noun*

تاقی باوەشێنی (لە مێعماری گۆتیکدا؛ fan vaulting *n*) ◌ تاق بادبزنی

**fan window** = fanlight

**fan worm** *noun*

کرمی باوەشێنی، بە پێکهاتەیێکی باوەشێنی ریشاڵی‌یەوە بۆ پالاوتنی ئاو [خێزانەکانی Sabellidae و Serpulidae: زۆر جۆرن] ◌ نوعی کرم

**fanzine** /'fænzi:n/ *noun*

فەنزین، هۆڤار (هۆگر + کۆڤار، کۆڤاری هۆگران یان نامەزرۆیان، تێکەڵەی fan2 و magazine) ◌ فانزین

**FAO** *abbreviation* Food and Agricultural Organization

فاو: رێکخراوەی خۆراک و کشتوکاڵ (سەربە نەتەوە یەکگرتووەکان) ◌ فائو

**FAQ** *abbreviation* frequently asked question

ئێف‌ئەی‌کیو، پرسیاری هەرزاربارە (پرسیارێ کە چەند جار کرابێتەوە) ◌ اف‌ای‌کیو

**far** /fɑ:(r)/ *adjective, adverb* (farther or further, farthest or furthest)

*adj* دوور، دوورەدەس، دەس‌پێڕانەگەیشتوو، ئەوبەری، ئەولای، لەوبەری: *at the far end of the room* 1 *adv* دوور: *wandered far from home* 2 زۆر، گەلێ، یەکجار 3 تا دەرنگانی، درەنگان، درەنگ ◌ *adj* دور، دوردست، آن

سوی adv 1 دور 2 زیاد، بسیار 3 دیر
**farad** /'færæd/ *noun*
یەکەی فراوانی ئێلیکتریسیتە یان کارەبا (کورتەکەی F. کورتکراوەی faraday) ◌ فاراد
**faraday** /'farədeɪ/ *noun, abbreviation*: F
(کیمیا) فارادای، یەکەی بڕی ئێلیکتریسیتە یان کارەبا (بنەڕەت: لە ناوی فیزیکزانی سەدەی 19 (Michael *Faraday* ◌ فارادای
**faradic** /fə'radɪk/ *adjective*, also faradaic
(فیزیک) هاندەرانە، هاندراو ◌ القایی، القاشده
**faradism** *noun*, also faradizations /ˌfærədaɪ'zeɪʃn/
فارادیزم (= چارەکردن بە تەزوو یا تەوژمی کارەبا) ◌ فارادیسم
**farandole** /ˌfar(ɔ)n'dəʊl, US 'far(ə)ndəʊl/ *noun*
(مێژوویی) جۆرێ هەڵپەڕکێی کرژ لە Provençal ◌ فاراندول
**farang** /fa'raŋ/ *noun*
ئەوروپایی، فەرەنگی ◌ اروپایی، فرنگ
**faraway** /'fɑ:rəweɪ/ *adjective, adverb*
*adj* 1 دوور، دوورەدەس، چەپەک: *faraway lands* 2 واقوڕماو (ڕوانین) *adv* لە دوور ◌ *adj* 1 دور، دوردست 2 بهتزده *adv* از دور
**farce** /fɑ:s, US fɑ:rs/ *noun*
1 شانۆی پێکەنینی یان گاڵتەجاڕی 2 گاڵتەجاڕی، گەپجاڕی، شۆخی: *The trial was a complete -rce* ◌ 1 نمایش خندەدار 2 لودگی
**farceur** /fɑ:'sɔ:/ *noun*
1 نووسەر یان پێرفۆرمێری farce 2 شۆخیباز، قۆشمە، قسەخۆش، نوکتەبێژ، گاڵتەجاڕ ◌ 1 فارسیور 2 بذلەگو
**farcical** /'fɑ:sɪkl, US 'fɑ:rs-/ *adjective*
پێکەنینی، گاڵتەجاڕ، گەپجاڕ، ludicrous: *It was a -ical trial* (farcicality *n*) ◌ مضحک
**farcically** /'fɑ:sɪkli, US 'fɑ:rs-/ *adverb*
بە شێوەیەکی پێکەنینی ◌ به طور مضحک
**farcy** /'fɑ:si/ *noun*
(ئەسپ و پاتاڵ) مرخە، مقاو، سەقاو، glanders ◌ کتو
**fardel** /'fɑ:d(ə)l/ = bundle (archaic)
**fare** /feə(r), US fer/ *noun*
1 کرێ (تاکسی، پاس و هتد): *train/rail fares* 2 سوار (ب.ت. تاکسی) 3 خۆراک، نان، پێخور، diet ◌ 1 کرایه 2 مسافر 3 غذا
**the Far East** *noun*
ڕۆژهەڵاتی دوور (چین، ژاپۆن و وڵاتانی تری ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا) ◌ خاور دور
**the Far Eastern** *adjective*
سەربە ڕۆژهەڵاتی دوور ◌ وابسته به خاور دور

**fare-stage** *noun*
فارستەیج ◌ کورس
**farewell** /ˌfeə'wel, US ˌfer'wel/ *noun, interjection*
*n* ماڵاوایی، خاترخازی، خوداحافیزی: *She said her farewells and left* *interj* خوات لەگەڵ! ◌ *n* خداحافظی *interj* خداحافظ!
**far-fetched** /'fɑ:fetʃt/ *adjective*
دوور (ودرێژ)، لە ڕاستی بەدوور، باوەڕپێنەکراو، ناڕاست، پێنەوەنراو: *The whole story sounds very far-fetched* ◌ بعید، اغراق‌آمیز
**far-flung** *adjective*
1 بەرین، بەربڵاو، بەرفرەهـ پەلهاوێشتوو: *a far-flung empire* 2 دوور، دوورەدەس: *expeditions to the far-flung corners of the world* ◌ 1 گسترده 2 دور، دوردست
**far gone** *adjective*
1 (نەخۆشی) بەرەو خراپی، شپرزە، زۆر نەخۆش، کاری، کەسکوون 2 مەستی مەست، کەیل ◌ 1 وخیم 2 کاملاً مست
**farina** /fə'rʌɪnə, US fə'ri:nə/ *noun*
1 نشاستە 2 (کۆن) ماکی ئاردی یا گەردەیی (بنەڕەت: لە لاتین، لە "corn" *far*) ◌ 1 نشاسته 2 مادەی پودری
**farinaceous** /ˌfarɪ'neɪʃəs/ *adjective*
نشاستەدار، نشاستەتیابوو، نشاستاوی ◌ نشاسته‌دار
**farkleberry** /'fɑ:k(ə)lˌb(ə)ri, US -ˌberi/ *noun, pl.* farkleberries
جۆرێ دەوەنی گەڵاچەرمینەی ئەستووری بەر نەخوراو، ڕەسەنی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەمریکا [*Vaccinium arboreum*] ◌ نوعی بوته
**farl** /fɑ:l/ *noun*
جۆرێ کەیکی ناسکی سکاتلەندی، لە ئارد یان برویش ◌ فارل
**farm** /fɑ:m, US fɑ:rm/ *noun, adjective*
*n* 1 کێڵگە، مووچە، بنەجووت، مەزرا، هێگا 2 (لە لێکدانا) شوێنی بەخێوکردن یان ڕاگرتن، ـــ داری، ـــ ڕاگری 3 شوێنی بەخێوکردن یان ڕاگرتنی ئاژەڵ (و ماسی) 4 زەوی ئیجارەیی یان بەئیجارەدراو 5 ماڵی جووتیار، خانووی سەر زەوی *adj* کشتوکاڵی ◌ *n* 1 مزرعه، کشتزار 2 محل پرورش، ـداری 3 محل دامداری 4 زمین اجارەای 5 خانەی کشاورز *adj* کشاورزی
**farman** = firman
**farm belt** *noun*
پشتێنەی کێڵگە ◌ کمربند کشتزار
**farmer** /'fɑ:mə(r), US 'fɑ:rm-/ *noun*
1 جووتبەندە، جووتیار، جووتدار، کشتکار، کێڵگەوان، وەرزێر 2 ئاژەڵدار، ئاژەڵڕاگر، پاتاڵدار ◌ 1 کشاورز، زارع 2 دامدار
**farm-hand** /'fɑ:mhænd, US 'fɑ:rm-/

*noun*
کریکاری کشتوکاڵ یا جووتبەندەیی، کریکاری کێڵگە یان مووچە ۞ کارگر کشاورزی یا مزرعە
**farmhouse** /ˈfɑːmhaʊs, US ˈfɑːrm-/ *noun*
ماڵی جووتبەندە، خانووی جووتیار ۞ خانەی کشاورز
**farming** /ˈfɑːmɪŋ, US ˈfɑːrmɪŋ/ *noun*
1 کشتوکاڵ، جووتبەندەیی، جووتداری، کەشاوەرزی، وەرزێری، وەرز، جووتیاری: *modern farming methods* 2 ئاژەڵداری، ئاژەڵڕاگری، پاتاڵداری، بەخێوکردنی ئاژەڵ ۞ 1 کشاورزی 2 دامداری
**farm labourer** *noun*
کریکار یان فەعلای کشتوکاڵ، کریکاری جووتبەندە، کریکاری وەرزێری ۞ کارگر کشاورزی
**farmland** /ˈfɑːmlænd, US ˈfɑːrm-/ *noun*
زەویوزار، کێڵگە، زەویوزاری کشتوکاڵ یان وەرزێری ۞ زمین کشاورزی
**farm machinery** *noun*
دەزگاکانی کشتوکاڵ ۞ ماشین‌آلات کشاورزی
**farm produces** *noun, pl.*
بەرووبووی کشتوکاڵ، بەرهەمە کشتوکاڵییەکان، حاسڵ و بەرهەمی کشتوکاڵ ۞ فرآوردەهای کشاورزی
**farmstead** /ˈfɑːmsted, US ˈfɑːrm-/ *noun*
کێڵگە و خانووبەرەکانی، کێڵگەوبەرە، ماڵی جووتبەندە: *a few scattered farmsteads* ۞ مزرعە و ساختمان‌های آن
**farm-worker** *noun*
کریکاری کێڵگە ۞ کارگر مزرعە
**farmyard** /ˈfɑːmjɑːd, US ˈfɑːrmjɑːrd/ *noun*
حەوشەی کێڵگە، حەساری مووچە، دەوروبەری کێڵگە ۞ حیاط مزرعە
**faro** /ˈfɛːrəʊ/ *noun*
جۆری قوماری پەڕین ۞ فارو
**Faroese** /ˌfɛːrəʊˈiːz/ *noun*, also Faeroese
1 فارۆئیز، فارۆئیزی (دانیشتووی رەسەنی دوورگەکانی فارۆئی 2 زمانی دوورگەکانی فارۆئی کە پێوەندییەکی نزیکی بە زمانی ئایسلەندیک Icelandicـەوە هەیە ) ۞ فاروایز
**far-off** /ˈfɑːr ɒf/ *adjective*
1 دوور، دوورەدەس، چەپەک، لاپەڕ: *a far-off land* 2 رابردوو (دوور): *memories of those far-off days* ۞ 1 دور، دورافتادە 2 گذشتە
**farouche** /fəˈruːʃ/ *adjective*
شەرمێون، شەرمن، کەمڕوو ۞ خجالتی، کم‌رو
**far-out** *adjective*
1 نائاسایی، باوەڕپێنەکراو، سەیر: *far-out clothes* 2 (نافەرمی) یەکجار باش، سەیر، عال ۞ 1 غیرعادی، عجیب 2 عالی، محشر
**far point** *noun*
خاڵی دوور، خاڵی مەودادار ۞ نقطەی دور
**farraginous** /fəˈrɑːdʒɪnəs, US -ˈreɪdʒ-/ *adjective*
تێکەڵە ۞ مخلوط
**farrago** /fəˈrɑːgəʊ, US -goʊ/ *noun, pl.* farragos or US farragoes
تێکەڵە، چێشتی مجێور ۞ معجون
**far-reaching** /ˌfɑː ˈriːtʃɪŋ/ *adjective*
1 بەربلاو، بەرین، زۆرداگر(توو)، پەلهاویشتوو، بەرفرەهـ 2 کاریگەر: *far-reaching changes/reforms* ۞ 1 گستردە، وسیع 2 مؤثر
**farrier** /ˈfæriə(r)/ *noun*
ناڵبەند (بنەڕەت: لە *ferrum* لاتین، لە *ferrarius* "ئاسن، ناڵ") ۞ نعل‌بند
**farriery** /ˈfæriəri/ *noun*
ناڵبەندی ۞ نعل‌بندی
**farrow** /ˈfærəʊ, US -roʊ/ *noun*
زایین، تەرەکین (بەراز)، بەچکەکانی بەرەی زگێ ۞ زایمان، تولەهای خوک
**farruca** /fəˈruːkə/ *noun*
جۆری سەمای flamenco ۞ فاروکا
**far-seeing** /ˈfɑː siːɪŋ/ *adjective*
1 بەمشوور، داهاتووبین، دووربین 2 چاوتیژ، farsighted ۞ 1 آیندەنگر، دوراندیش 2 تیزبین
**Farsi** /ˈfɑːsiː, US ˈfɑːrsiː/ *noun*
زمانی فارسی ۞ زبان فارسی
**far-sighted** *adjective*
1 داهاتووبین، بەمشوور، تێگەیشتوو، دووربینانە، بەمشوورانە 2 چاوتیژ، دووربین ۞ 1 آیندەنگر، دوراندیش، دوراندیشانە 2 دوربین
**far-sightedly** *adverb*
داهاتووبینانە، بەمشوورانە، تێگەیشتووانە، دووربینانە، بەمشوورانە ۞ آیندەنگرانە، دوراندیشانە
**far-sightedness** *noun*
1 بەمشووری، داهاتووبینی، دووربینی 2 چاوتیژی، دووربینی ۞ 1 آیندەنگری 2 دوربینی
**fart** /fɑːt, US fɑːrt/ *noun*
1 تڕ، جووک، تس، فس، وردەبا، با 2 مرۆی گەوجولەوج یا عاجزکەر ۞ 1 گوز، چس 2 آدم احمق
**farther** /ˈfɑːðə(r), US ˈfɑːrð-/ *adjective, adverb*, also further
1 دوورتر، ئەولاتر: ◊ *farther north/south* 2 پاشتر، پێشتر: *farther along the road* 3 پتر، زۆرتر ۞ 1 دورتر 2 جلوتر 3 بیشتر
**farthermost** = furthermost
**farthest** /ˈfɑːðɪst, US ˈfɑːrð-/ *adjective, adverb*, also furthest
1 دوورترین، هەرەدوور، دواترین، پاشترین،

ئاخر، زۆرترین، درێژترین 2 ــترین (نیشانەی ئاوەڵناوی باڵا)، زۆر، زۆرتر، لە هەموو دوورتر ◌ 1 دورترین، بیشترین، آخرین، طولانی‌ترین 2 ـترین، بسیار، دورتر از همه

**farthing** /'fɑːðɪŋ, US 'fɑːrðɪŋ/ *noun*
1 فارسینگ، فاردینگ (کۆینی جارانی بریتانیا بەرامبەر بە چارەکی پێنی کۆن) 2 شتی هەرە بێ‌نرخ ◌ 1 فاردینگ 2 چیز کم ارزش

**farthingale** /'fɑːðɪŋgeɪl/ *noun*
(مێژوویی) داوێنی چەتری یا میلی یا هەڵماساو ◌ دامن فنری

**the Far West** *noun*
ڕۆژاوای دوور (بەشێکی ئەمریکا نزیک بە کەنارەکانی پەسیفیک) ◌ غرب دور

**fasces** /'fasiːz/ *noun, pl.*
1 چەپکە: تەوری دیاری نێوان چەپکەدار یان میلێکی پێکەوەبەسراو، لە لایەن lictor لە ڕۆمی کۆندا وەک نیشانەی دەسەڵات هەڵدەگیرا 2 نیشانەی دەسەڵات لە ئیتالیای فاشیستیدا ◌ فاسیز

**fascia** /'feɪʃə/ *noun*
1 بەست، بەند، باریکە، چوارچێوەی درگا 2 تابلۆی دووکان (لە سەردەرانەی دووکان هەڵدەواسرێ) 3 تەختەداشبۆرد، داشبۆرد 4 (بیناسازی) نەخش یان گەچبڕی سەرکۆڵ 5 (توێکاری) /'faʃə/, *pl.* fasciae /-ʃiː/ بەرگێکی تەنک یان ناسکی شانەی ڕیشاڵی، دەوری ماسوولکە یان ئەندامێکی تر دەدا، توێژاڵ یان توێی بەرگی ڕیشاڵی، کراسبەز، پەردەی زگ، چەرمەچەقاڵتە؟ 6 (ئەستێرەوانی) پشتێنە، ئاڵقە، کەمە ◌ 1 نوار، چهارچوب در 2 تابلوی مغازه 3 صفحه‌ی داشبود، داشبورد 4 لب‌بند 5 صفاق، لایه‌ی پوششی فیبری 6 (نجوم) کمربند، حلقه

**fascia board** *noun*
تەختەداشبۆرد، داشبۆردگە، سەفحە داشبۆرد ◌ صفحه‌ی داشبورد

**fascial** *adjective*
(توێکاری) سەربە fascia ◌ وابسته به fascia

**fasciated** /'faʃɪeɪtɪd, US -ɪətɪd/ *adjective*
(ڕووەکناسی) ڕیزی، میل‌میل، بەنۆکەدار، (نائاسایی) تێکترنجاو، تێکپەسراو ◌ (گیاه‌شناسی) نواردار، به هم‌فشرده

**fascicle** /'fasɪk(ə)l/ *noun*
1 (هەروەها fascicule /-kjuːl/) بەشێکی بە جیا بڵاوەبووی کتێبێ،ناملکە، سپارە 2 (توێکاری و زیندەناسی) هەروەها fasciculus /fə'sɪkjʊləs/) گورزە، چەپکە، بەستە (بنەڕەت: لە fasciculus لاتینی، چکۆلینراوی fascis ("bundle" ◌ 1 جزوه 2 بسته

**fascicled** *adjective*
1 ناملکەدار، سپارەدار 2 گورزەدار، چەپکەدار ◌ 1 دارای جزوه 2 دارای بسته

**fascicular** *adjective*, also fasciculate /fə'sɪkjələt/
1 سەربە fascicle 2 سپارەسپارە 3 چەپکەچەپکە، گورزەگورزە ◌ 1 وابسته به fascicle 2 جزوه‌جزوه 3 دسته‌دسته

**fasciculation** /fa,sɪkjʊ'leɪʃ(ə)n/ *noun*
(زۆرتر زیندەناسی) ڕێکخستن یان ڕێکخرانی گورزەیی یان چەپکەیی ◌ آرایش بسته‌ای

**fasciitis** /,fasɪ'ʌɪtɪs, US ,faʃɪ-/ *noun*
(پزشکی) ئاوسانی fascia ماسوولکە یان ئەندامێ (بە نەخۆشی یا برینداری) ◌ فاسیتیس

**fascinated** /'fæsɪneɪtɪd/ *adjective*
شەیدا، سەوداسەر، دڵڕاکێشراو، دڵتێچوو، یەکجار تامەزرۆ، دڵبەستە، تەلەسمکراو ◌ مجذوب، مسحور

**fascinating** /'fæsɪneɪtɪŋ/ *adjective*
دڵ(ڕا)کێش، دڵبەر، زۆر خۆش، دڵرفێن، سەرنجڕاکێش، باڵکێش، تەلەسماوی ◌ مسحورکننده، جذاب، گیرا، سحرآمیز

**fascinatingly** /'fæsɪneɪtɪŋli/ *adverb*
سەرنجڕاکێشانە، بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش ◌ به طور جذابی

**fascination** /,fæsɪ'neɪʃn/ *noun*
1 سەرنجڕاکێشی، دڵرفاندن، ڕاکێشان، دڵرفێنی، دڵکێشی، زۆرخۆش بوون، سەوداسەری، شەیدایی، دڵبەستەیی، دڵتێچوون، دڵبردن 2 سێحر، تەلەسم، جادوو ◌ 1 جذبه، گیرایی، شیفتگی 2 سحر

**fascinator** *noun*
سەرنجڕاکێش، دڵرفێن ◌ گیرا

**fascine** /fa'siːn/ *noun*
چەپکەلوولە، گورزەلوولە، چەپکەمیل ◌ فاسین

**fascism** /'fæʃɪzəm/ *noun*, also Fascism
1 فاشیزم، پاشبڕۆیی (= ئاماژە بە ڕژێمی مۆسۆلینی لە ئیتالیا 1922–43.) 2 (زۆرجار Fascism) فەلسەفە، بنەماکان یان ڕێبازە و شێوەکانی فاشیزم ◌ فاشیسم

**fascist** /'fæʃɪst/ *noun, adjective*, also Fascist
*n* 1 فاشی، فاشیست، فاشیباوەڕ 2 ئەندامی بزووتنەوە یان پارتییێکی فاشیستی 3 کەسێکی زۆردار یا بە بیروباوەڕێکی یەکجار ڕاستڕەوانە یان ڕاستخوازانە، پاشبڕۆ، ڕاست(گر)ی تونڕەو *adj* 1 کۆنەپەرستانە 2 (هەروەها Fascistic) سەربە یان لە شێوەی فاشیزم یان فاشیزمی ئیتالیا ◌ *n* 1 فاشیست 2 عضو جنبش یا حزبی فاشیستی 3 فاشیست *adj* فاشیستی، مرتجع، ارتجاعی 2 وابسته به فاشیسم یا فاشیسم ایتالیا

**Fascista** *noun, pl.* Fascisti
فاشیستا: ئەندامی ڕێکخراوەی ڕامیاری یان سیاسی ئیتالیا لەژێر دەسەڵاتی مۆسۆلینی 1922-1943 Mussolini و بەپێی بنەماکانی

فاشیزم ◌ فاشیستا

**fascistic** *adjective*

فاشیستی ◌ فاشیستی

**Fascisti** *noun, pl.*

فاشیستەکان، فاشییەکان ◌ فاشیستها

**fashion** /'fæʃn/ *noun*

1 شێوە، ڕێگا، تەرز، جۆر، شێواز 2 باو، داب، سان، مۆد: *dressed in the latest fashion* 3 ڕوسم، دەستوور، شتی باو یان برەومەند ◌ 1 روش، نحوه، طریقه، اسلوب، سبک 2 مد 3 رسم، امر رایج

**fashionable** /'fæʃnəbl/ *adjective*

1 ڕۆژبابەت، باوی ڕۆژ، ڕۆژباو 2 مۆدپەرست، مۆدباز، دابپەرست 3 باودار، باو، برەومەند، برەودار 4 لەسەرزەمان، لە ئارادا: *fashionable clothes/furniture/ideas* ◌ 1 مد روز 2 آلامد 3 متداول، رایج 4 مطرح

**fashionably** /-əbli/ *adverb*

بەپێی داب، دابانە، بەپێی دابی ڕۆژ: *fashionably dressed* ◌ مطابق مد

**fashion house** *noun*

دابخانە، باوخانە، کۆمپانیای بەرهەمهێنەری شێوازی جلوبەرگی گران ◌ هاوس فاشیون

**fashionista** /ˌfæʃn'iːstə/ *noun*

1 دابپەرست، مۆدپەرست، مۆدباز، باوخواز 2 داڕێژەری haute couture ◌ 1 مدپرست 2 طراح haute couture

**fashion plate** *noun*

کەسێ کە پێخۆشە جلوبەرگی زۆر باو لەبەر بکا ◌ فاشیون پلیت

**fashion show** *noun*, also fashion parade

پیشاندانی شێوازەکانی جلوبەرگی نوێ لەبەر چاو خەڵک ◌ نمایش فاشیون

**fashion victim** *noun*

قوربانی مۆد، ڕادراوی داب، کوشتەی داب (یان مۆد) ◌ قربانی مد

**fast**[1] /fɑːst, US fæst/ *adjective, adverb*

*adj* 1 پتەو، تۆکمە، قایم، ڕەختە، نەلەق، ڕەق، سەخت، داکوتراو 2 کاڵنەبوو، ڕەنگنەڕۆیشتوو، پاکەوەنەبوو، جێگیر 3 بەوەفا، پتەو، بەئەمەک، پێزان 4 دەسبڵاو، خۆشگوزەران، خۆشڕابوێر 5 توند، لەزگین، تونرەو، خێرا 6 (لە) پێش (کاتژمێر) 7 هەستیار (فیلم، لەبەر ڕووناکی) *adv* 1 بە توندی، توند، خێرا 2 نزیک ◌ *adj* 1 محکم، سفت 2 ثابت (رنگ) 3 استوار، پابرجا 4 ولخرج، عیاش 5 سریع، سریع‌السیر 6 جلو (ساعت) 7 حساس *adv* 1 بە سرعت 2 نزدیک

**fast**[2] /fɑːst, US fæst/ *noun*

ڕۆژوو، ڕۆژگ، ڕۆژی (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ روزه

**fastball** /'fɑːstbɔːl, US 'fæst-/ *noun*

تون(د)بۆل، فەستبۆل (لە یاری بەیسبۆڵدا) ◌ فاستبول

**fast day** /'fɑːst deɪ/ *noun*

ڕۆژێ کە لەبەر هۆی دینی مرۆڤ خۆی لە هەر خواردنێ دەبوێرێ ◌ فاست‌دی

**fastener** /'fɑːsnə(r), US 'fæs-/ *noun*

1 قوولاپ، بەند، بەست، دەسک، دەسەگیرە، گیرە، ئەشکنجە 2 دوگمە، لێکبەست، لێکهەڵپێک، پێکبەست، داخە(ر)، ئاغزۆنە، پزیم، قازانقوفڵی، قرتینە، دەرزی (سنجاغ)، دەرزی بەرکوژە 3 زنجیر ◌ 1 قلاب، گیره، چفت 2 وصل‌کننده، دگمه، سگک، قزن‌قفلی 3 زیپ

**fastening** /'fɑːsnɪŋ, US 'fæs-/ *noun*

قوفل، کلۆم، گوڵە ◌ قفل، چفت

**faster** *noun*

بەڕۆژوو، ڕۆژگەوان ◌ روزه‌دار

**fast food** *noun*

خۆراکی ئامادە، چێشت یان نانی حازری ◌ غذای حاضری

**fast forward** *noun*

خستنەپێش (بۆ هەڵکردن، ڤیدیۆ، کاسێت‌پلەیر وهتد) ◌ فاست فوروارد

**fastidious** /fæ'stɪdiəs/ *adjective*

سەختگر، بەهانەگر، بەسەرنج، ورد، دیرپەسند، درەنگ‌هەڵبژێر، عەیبگر: *Everything was planned in fastitidious detail* ◌ مشکل‌پسند، وسواسی

**fastidiously** /fæ'stɪdiəsli/ *adverb*

عەیبگرانە، سەختگرانە، دیرپەسندانە ◌ به طور مشکل‌پسند

**fastidiousness** /fæ'stɪdiəsnəs/ *noun*

سەختگری، بەسەرنجی، وردی، بەهانەگری، دیرپەسندی، درەنگ‌هەڵبژێری، عەیبگری ◌ مشکل‌پسندی

**fastigiate** /fa'stɪdʒɪət, US -ieɪt/ *adjective*

1 (ڕووەکناسی) ڕاست‌هەڵچوو: *fastigiate trees* 2 نووکدار ◌ 1 فاستیگیت 2 نوک‌دار

**fastigium** *noun, pl.* fastigia

نووک، سەر ◌ نوک

**fasting** *noun*

ڕۆژوو، ڕۆژی، بەڕۆژوویی، ڕۆژووگرتن، بێبوون (ی ڕۆژوو) ◌ روزه، روزه‌داری

**fast lane** *noun*

توندەڕێ، هێڵی پێشکەوتن ◌ خط سبقت

**fastness** /'fɑːstnəs, US 'fæs-/ *noun*

1 نەڕۆیشتن، مانەوە، کاڵنەبوونەوە (ڕەنگ) 2 پتەوی، تۆکمەیی، قایمی 3 خێرایی، توندی، لەز، پەلە ◌ 1 ثبات 2 استحکام، استواری 3 سرعت، تندی

**fat** /fæt/ *adjective, noun*

*adj* 1 چەور، لەبە، بەزاوی، پیواوی، قەڵەو 2 زلە، گەورە، زەلام، ئەستوور، قاڵند، قەوی 3

زۆر، لۆدە، زەبەن، یەکجار 4 دابەستە، دەرماڵە، پەروار، بەختە 5 بەبرشت، بەمایە، مایەدار، بەپیت (زەوی) *n* 1 کاری بەخێر یا پرداهات 2 چەوری، تەواش، پیو، بەز، گۆهن، ڕۆن، زوم ۞ *adj* 1 چرب، چاق 2 کلفت، گندە، هنگفت 3 پرواری 4 بارور *n* 1 کار پردرآمد 2 چربی، پیە، روغن

**fatal** /ˈfeɪtl/ *adjective*
1 کوشندە، مەرگاوی، مەرگبار، مەرگهێنەر، گیانئەستێن، تیابەر، مرۆک، گیانگر 2 بەزیان، ماڵوێرانکەر، کارەساتاوی، کارەساتبار، بەوەی، پرمەترسی، گرنگ، گەورە 3 دیاریکەر، بڕیاردەر، یەکلاییکەرەوە 4 بێودم، نگریس، شووم 5 چارەلێدراو، چارەنووسدیاریکردوو، لەناوچەوان‌نووسراو، دەبێ، پێشتردیاریکراو ۞ 1 مهلک، مرگبار 2 مخرب، خطرناک 3 تعیین‌کننده، حیاتی، خطیر 4 مشئوم 5 محتوم، مقدر

**fatalism** /ˈfeɪtəlɪzəm/ *noun*
چارەنووسگەری، چارەنووسباوەڕی، چارەنووسخوازی، پێشدیارباوەڕی ۞ تقدیرگرایی، جبری‌گری

**fatalist** /ˈfeɪtəlɪst/ *noun*
چارەنووسگەر، چارەنووسباوەڕ ۞ تقدیرگرا

**fatalistic** /ˌfeɪtəlˈɪstɪk/ *adjective*
چارەنووسگەرییانە، سەربە چارەنووسباوەڕی ۞ وابسته به تقدیرگرایی

**fatalistically** /ˌfeɪtəˈlɪstɪkəli/ *adverb*
چارەنووسگەرانە، چارەنووسباوەڕانە ۞ تقدیرگرایانه

**fatality** /fəˈtæləti/ *noun, pl.* fatalities
1 مەرگ، نەمان، مردن، تیاچوون، مردنی ناسروشتی، کوشندەیی 2 چارەنووس، چارەنفیس 3 بەلا، ماڵوێرانی، بەدبەختی، نەهامەتی، مەینەتی، کارەسات 4 کاریگەری کوشندە ۞ 1 مرگ، مهلک بودن 2 تقدیر، سرنوشت 3 فاجعه، مصیبت 4 اثر مهلک

**fatally** /-təli/ *adverb*
کوشندانە، بە شێوەیەکی کوشندە، ، بە شێوەیەکی مەرگبار، مەرگاوییانە ۞ به طور مهلک

**Fata Morgana** /ˌfɑːtə mɔːˈɡɑːnə/ *noun*
تراویلکە، ڕەورەوەک، سەراب (بنەڕەت: لە ناوی ژنە جادووگەری ئەفسانەیی *Morgan le Fay*، خوشکی Arthur شا) ۞ سراب

**fatback** *noun*
1 بەز و چەوری سەرووی لایەکی بەراز 2 = menhaden ۞ فتبک

**fat cat** *noun*
کەسێکی دەسڕۆیشتوو و دەوڵەمەند ۞ آدم مقتدر و ثروتمند

**fat dormouse** *noun*
جۆرێ dormouse ڕەهۆڵلێدەری burrowing شێوە squirrel هی ئەورووپا و ئاسیای بچوک، جاروبار ڕادەگیرێ یان ڕاو دەکرێ [*Glis glis*] ۞ نوعی موش

**fate** /feɪt/ *noun*
1 چارەنووس، قسمەت، قەزاوقەدەر: *The fate of the three men is unknown* 2 داهاتووی کەسێ، ئاقیبەت، ئاخر 3 ئەجەل، ئاکام 4 مەرگ، مردن، تیاچوون ۞ 1 تقدیر، سرنوشت، قضا و قدر 2 عاقبت 3 اجل 4 مرگ

**fated** /ˈfeɪtɪd/ *adjective*
چارەنووسلێدراو، چارەلێدراو، مقەدەر، لەناوچەوان‌نووسراو، دەبێ، پێشتردیاریکراو، قسمەت: *We were fated never to meet again* ۞ مقدر

**fateful** /ˈfeɪtfl/ *adjective*
1 دیاریکەر، بڕیاردەر، یەکسەرەکەرەوە، بڕینەرەوە، یەکلاییکەرەوە، گرنگ، چارەنووسساز، decisive 2 بەدفەڕ، نگریس، نەگریس، بەدشووم، بێودم ۞ 1 تعیین‌کننده، خطیر، مهم 2 منحوس

**fatefully** /ˈfeɪtfli/ *adverb*
دیاریکەرانە، یەکلاییکەرەوانە ۞ به طور تعیین‌کننده

**the Fates** *noun, pl.*
سێ خواژنی چارەنووس (لە میسۆلۆژی یونانیدا) ۞ الهگان سرنوشت

**fat farm** *noun*
شوێنی سلامەتی، شوێنی بۆ کەمکردنەوەی کێش و قورسایی و باشکردنی سلامەتی ۞ فات فارم

**fat-free** *adjective*
بێچەوری: *fat-free yogurt* ۞ بدون چربی

**fathead** *noun*
(نافەرمی) مرۆی گەوج و کەر، گوێلک (fatheaded *adj*) ۞ آدم احمق

**fat hen** *noun*
سەڵەمکە، تەرەسلێمانە [*Chenopodium alba*] ۞ سلمک، سلمەی تره

**father** /ˈfɑːðə(r)/ *noun*
1 باوک، بابەر، باو، باف، باوگ 2 دامەزرێنەر، بناخەدانەر، بنیاتنەر، پێشەنگ 3 باوکی ئاینی، قەشە 4 ریش‌سپی، پیر 5 پارێزەر، چاوبەسەر 6 (fathers) باو و باپیران، باب و کال، پێشینیان 7 (Father) خوداوەند، خوا 8 (Father، کورتەکەی Fr) سەرناوی بۆ قەشەی کلێسەی کاتۆلیک و ئۆرتۆدۆکس (fatherlike *adj, adv*؛ بنەڕەت: *fæder* ئینگلیسی کۆن، ئەڵمانی بنەڕەت، لە ڕەگی هیند و ئەورووپایی، لە *pater* لاتین و *patēr* یونانی) ۞ 1 پدر 2 بابا، مؤسس 3 پدر روحانی، کشیش 4 ریش‌سفید، مرشد 5 محافظ 6 (در جمع) اجداد، نیاکان 7 (Father) خدا 8 فادر

**Father Christmas** *noun,* also Santa Claus NAmE, BrE

باپانوئێـــل، ســـەنتا كلـــەوز santa claus باوكەكریسمەس ◌ بابا نوئل

**father figure** *noun*

پیر، ریش‌سپی، ردێن‌سپی، كەیخودا، گەورە ◌ شیخ، ریش‌سفید

**fatherhood** /ˈfɑːðəhʊd, US -ðərhʊd/ *noun*

باوكێتی، باوكایەتی، باوێتی ◌ پدری

**father-in-law** /ˈfɑːðər ɪn lɔː/ *noun, pl.* fathers-in-law

خەزوور ◌ پدرزن، پدرشوهر

**fatherland** /ˈfɑːðəlænd, US -ðərlænd/ *noun*

1 زێد، نیشتمان، ئاووگڵ، وڵاتی باو و باپیران 2 (the Fatherland) ئەڵمانیا بەدرێژایی سەردەمی دەسەڵاتی هیتلێر ◌ 1 وطن، میهن 2 آلمان

**fatherless** /ˈfɑːðələs, US -ðərləs/ *adjective*

1 سەغیر، سێوی، هەتیو، باوك‌مردوو، بێ‌باوك، بێ‌سەرپەرشت: *fatherless children/families* 2 زۆڵ، بێژوو ◌ 1 یتیم، بی‌پدر 2 حرام‌زاده

**fatherliness** *noun*

خۆشەویستی باوكانە، دڵنەرمی باوكێتی، باوكێتی ◌ محبت پدری، پدری

**fatherly** /ˈfɑːðəli, US -ðərli/ *adjective*

باوكانە، وەكوو باوك: *He keeps a fatherly eye on his players* ◌ پدرانه

**Father's Day** *noun*

ڕۆژی باوك (لە ئەمریكا و بریتانیا سێیەمین یەكشەممەی June) ◌ روز پدر

**Father Time** *noun*

كات كە وێچوێنراوە بە پیرەپیاوێكی ریشن كە مەلەغان و سەعاتێكی لمی هەڵدەگرێ ◌ فاتر تایم

**fathom** /ˈfæðəm/ *noun*

1 بەژن، باڵا (= یەكەی پێوانی قووڵایی ئاو بەرامبەر بە 1/83 میتر یان 6 پێ) 2 = comprehension (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ بغل، فاتوم

**Fathometer** *noun*

(دروشمی بازرگانی) قووڵایی‌پێو ◌ ژرفاسنج

**fathomless** *adjective*

1 قووڵ، بێ‌بن، بێ‌بنك 2 لە ئەندازبەدەر، بێ‌كۆتایی، لەدوایی‌نەهاتوو 3 ئاڵۆز، لێڵ، ڕێ‌پێنەبراو، سەرەندەرنەكراو، سەرلێدەرنەهێنراو ◌ 1 عمیق، مجهول‌الكنه، بی‌ته 2 بی‌پایان 3 غیرقابل فهم، درك‌نكردنی، بغرنج

**fatidic** *adjective,* also fatidical

سەربە پێش‌بینی، پێش‌بینی‌یانە ◌ وابسته به پیش‌بینی

**fatigable** /fæðəməbl/ *adjective*

زووماندوو (fatigability *n*) ◌ خستگی‌پذیر

**fatigue** /fəˈtiːg/ *noun*

1 ماندوویی زۆر، ماندوویەتی، شەل‌وكوت‌بوون، لەپێكەوتن (لەبەر كاری سەخت یان مەشق): 2 *physical and mental fatigue* (كانزاناسی) لاوازی، شەكەتی 3 كاری سەخت، كوڵەمەرگی 4 (سەربازی) بێگاری، كاری زۆرەملێی 5 (fatigues) بەرگی شەڕ، یونیفۆرمی شەڕ ◌ 1 خستگی زیاد 2 (فلزات) خستگی 3 جان‌كنی 4 (نظامی) كار اجباری 5 (در جمع) اونیفورم جنگ

**fatigued** /fəˈtiːgd/ *adjective*

شەكەت، ماندوو، لەپێ‌كەوتوو (هەم جەستەیی و هەم مێشكی) ◌ خسته

**fatigueless** *adjective*

كۆڵنەدەر، ماندوونەناس، ماندوونەبوو ◌ خستگی‌ناپذیر

**fatiguing** /fəˈtiːgɪŋ/ *adjective*

(فەرمی) ماندووكەر، شەكەت‌كەر، ناخۆش، سەخت، exhausting ◌ خسته‌كننده

**Fatiha** /ˈfɑːtɪə, US ˈfat-/ *noun,* also Fatihah

فاتیحا (یەكەمین سوورەی قورئان) ◌ فاتحه

**Fatimid** /ˈfatɪmɪd/ *noun*

ئەندامی بەرەی فاتمی‌یەكان، بەسەر چەندین بەشی باكووری ئەفریكا، میسر و سووریا لە 909 تا 1171 دەسەڵاتیان كرد (خۆیان دەگەڕێنەوە بۆ "فاتمە Fatima" كچەگەورەی محەممەدی پێغەمبەر) ◌ فاطمی

**fatless** *adjective*

بێ‌چەوری ◌ بدون چربی

**fatling** *adjective, noun*

*adj* دابەستە، دەرماڵە *n* بەچكەی دابەستە (گوێلك، بەرخ و هتد) ◌ *adj* پرواری *n* (بچەی) حیوان پرواری

**fatness** /fætnəs/ *noun*

قەڵەوی: *Fatness tends to run in families* ◌ چاقی

**fatso** /ˈfætsəʊ, US -soʊ/ *noun, pl.* fatsoes

(نافەرمی، سووكانە) گمتە، بنیادەمی قەڵەو ◌ خیگی آدم چاق

**fatstock** *noun*

ئاژەڵی دابەستە، ئاژەڵی گۆشتی، دەرماڵە، ڕەپێتە ◌ دام پرواری

**fattening** /ˈfætnɪŋ/ *adjective*

قەڵەوێنەر، قەڵەوكەر ◌ چاق‌كننده

**fattish** *adjective*

كەمێ قەڵەو، خرپن، خڕوخۆڵ ◌ نسبتاً چاق، تپل

**fattism** /ˈfætɪzəm/ *noun*

گاڵتە بە كەسانی قەڵەو، قەڵەوئازاری ◌ چاقی‌ستیزی

**fattist** /ˈfætɪst/ *noun*

گاڵتەچی بە كەسانی قەڵەو، قەڵەوئازار ◌ چاقی‌ستیز

**fatty** /'fæti/ *adjective* (fattier, fattiest), *noun* (*pl.* fatties)
*adj* چەور، بەپیو، بەزاوی، زۆمدار، پرچەور: *fatty tissue* ◊ *fatty foods* *n* قسەیەکی ناخۆشە سەبارەت بە کەسانی قەڵەو، گمتە: ◊ *'Hey, Fatty, bring us another beer.'*
*adj* چرب، چربی‌دار *n* خیگی

**fatty acid** *noun*
ترشەڵۆکی چەوری، ترشی چەوری ◊ اسید چرب

**fatty cycle** *noun*
سووڕی چەوری ◊ چرخش چرب

**fatuity** /fə'tju:əti/ *noun*, also fatuities
1 کەریتی، گەوجیتی، گەمژەڵی، نەفامی 2 هەڵس‌وکەوتی گەوجانە ◊ 1 بلاهت، حماقت 2 رفتار احمقانە

**fatuous** /'fætʃuəs/ *adjective*
1 کەر، گەوج، حەپە، نەفام، گەمژەل، دەبەنگ 2 گەوجانە: *a fatuous remark* (fatuously /'fætʃuəsli/ *adv*: گەوجانە، نەفامانە) ◊ 1 ابلە، بی‌شعور، احمق 2 احمقانە

**fatuousness** /'fætʃuəsnəs/ *noun*
کەریتی، گەوجیتی، گەمژەڵی ◊ حماقت، بلاهت

**fatwa** /'fætwa:/ *noun*
فەرمان، فتوا ◊ فتوا

**fauces** /'fɔ:si:z/ *noun, pl.*
(توێکاری) گەروو، قوڕوو (بنەڕەت: لە لاتینەوە "throat") ◊ حلق

**faucial** /'fɔ:ʃ(ə)l/ *adjective*
گەروویی، سەربە گەروو یان قوڕوو ◊ حلقی

**faucet** /'fɔ:sɪt/ *noun*
شیرە، بەلووعە: *the* ◊ *to turn a faucet on/off* ◊ *hot/cold faucet* ◊ شیر

**fault** /fɔ:lt/ *noun*
1 عەیب، خەوش، گەرد، گرفت، گیر 2 گوناح، سووچ، خەتا، هەڵە، چەوتی، شاشی 3 خاڵی لاوازی، شکستی، ئیراد، عەیب 3 (لە تێنیس یان وەرزشە هاوشێوەکاندا) هەڵە، خەتا 4 (زەوی‌ناسی) قلیش، قەڵەشت، درایی؟ (دەبێتە هۆی جێ‌گۆڕکێی چینەکان) ◊ 1 عیب، نقص 2 تقصیر، اشتباه 3 نقطەضعف 4 (تنیس) خطا 5 گسلە

**faultfinder** /fɔ:ltfaɪndə(r)/ *noun*
ئیرادگر، رەخنەگر، عەیب‌دۆز(ەرەوە)، والاگر ◊ عیب‌جو

**faultfinding** /fɔ:ltfaɪndɪŋ/ *noun*
ئیرادلێ‌گرتن، رەخنە(لێ‌گرتن)، عەیب‌لێ‌دۆزینەوە، والاگری، والاگرتن ◊ عیب‌جویی

**faultless** /'fɔ:ltləs/ *adjective*
بێ‌عەیب، بێ‌خەوش، بێ‌گەرد، بێ‌قەباحەت، تەواو (faultlessly *adv*: بێ‌خەوشانە، بێگەردانە؛ faultlessness *n*) ◊ بی‌عیب، کامل

**faulty** /'fɔ:lti/ *adjective* (faultier, faultiest)
بەعەیب، بەخەوش، عەیب‌دار، نیوەچڵ، ناتەواو، هەڵە، نادروست، شاش، چەوت، imperfect (faultily *adv*: بە هەڵە، بە شێوەیەکی نادروست؛ faultiness *n*) ◊ معیوب، ناقص، غلط، اشتباه

**faun** /fɔ:n/ *noun*, from Latin *faunus*, from *Faunus*
فۆن (= خوای مووچە و کێڵگە و دارستانەکان، بە لاق و شاخی بزنەوە و لەشی مرۆڤ: لە میتۆلۆژی رۆمی‌دا) ◊ فون

**fauna** /'fɔ:nə/ *noun*
گیانەوەران (= هەی سەردەم، ژینگە یان ناوچەیێ) ◊ فونا، جانوران

**faunal** /'fɔ:nəl/ *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە fauna ـەوە هەیە ◊ وابستە بە فونا

**faunistic** /fɔ:'nɪstɪk/ *adjective*
سەربە گیانەوەران، پێوەندی بە گیانەوەرانەوە هەیە ◊ وابستە بە جانوران

**Faunus** *noun*, Latin
فۆنووس (= خوای گیانەوەران لە میتۆلۆژی رۆمی‌دا) ◊ فونوس

**Faust** *noun*, also Faustus, German legend
فاوست: جادووگەرێکی ئەفسانەی ئەڵمانی کە لەگەڵ شەیتان پەیمان دەبەستێ ◊ فاوست

**Faustian** /'faʊstɪən/ *adjective*
فاوستی، سەربە Johann Faust ی ئەڵمانی ◊ فاوستی

**Fauve** /'fəʊv, French fov/ *noun, adjective*
*n* فۆڤ: ئەندامی فۆڤیزم، فۆڤیست *adj* (بڕوانە Fauve) سەربە یان پێوەندی بە فۆڤیستەکانەوە هەیە (بنەڕەت: لە فەرەنسییەوە "wild beast"، لەگەڵ ئاماژە بە بۆچوونێ لە لایەن رەخنەگری هونەری‌یەوە Louis Vauxcelles) ◊ *n* عضو فاوفیسم، فاوف، فاوفیست *adj* فاوف

**Fauvism** /'fəʊvɪzəm, US 'foʊv-/ *noun*
فۆڤیزم، لاوڕگەری: رێبازێکی هونەری (وێنەکێشی) سەرەتای سەدەی بیستەم، ئازادە لە هەر کۆت‌وبەندێکی نەریتی) ◊ فاوفیسم

**Fauvist** /'fəʊvɪst, US 'foʊv-/ *noun, adjective*
*n* فۆڤیست، لاوڕگەر *adj* فۆڤیستی ◊ *n* فاوفیست *adj* فاوفیستی

**faux** /fəʊ/ *adjective*
دەسکرد، لاهیە، نارەسەنی، ناتاسایی، ساختە، رووکەش، ناڕاستەقینە، درۆ، artificial: *faux marble* (بنەڕەت: فەرەنسی "false") ◊ مصنوعی، تصنعی

**faux pas** /fəʊ 'pɑ:, French fo pa/ *noun, pl.* same
لێ‌هەڵقلیشان، لێ‌داقلیشان، کردەوە یان وتەی

نابەجێ، قسە لە دەم دەرپەڕین (فەرەنسی "هەنگاوی هەڵە false step") ◌ اشتباه فاحش

**fava bean** /ˈfɑːvə/, also faba bean = broad bean

**fave** /feɪv/ *noun*

مرۆ یان شتی بەردڵکەوتوو یان پەسند ◌ آدم یا چیز مورد علاقه

**favela** /fəˈvɛlə/ *noun*

(لە برێزیل) شارەکۆختە، شارەکەلاوە (بنەڕەت: لە پۆرتوگالی‌یەوە) ◌ حلبی‌آباد

**favonian** *adjective*

1 فێنک، مامناوەند 2 سەربە بای ڕۆژاوا ◌ 1 معتدل 2 وابسته به باد غربی

**favour** /ˈfeɪvə(r)/ *noun*, US favor

1 چاکە، باشە، پیاوەتی، خاسی، سایە، قنجی 2 پشتیوانی، لایەنگری 3 جیاوازی‌دانان 4 یارمەتی، دەس‌گرتن، دڵسۆزی، ئاوڕدانەوە، لالێدانەوە 5 خۆشەویستی 6 قازانج، سوود، بەهرە، مەفا 7 جیاوازی، فەرق 8 نیشانە، دروشم 9 (کۆن) ژنێ کە رازی بووە لەگەڵ پیاوێ هاوجێیی بکا 10 یادنامە، نامە 11 (favours) خۆشی هاوجێیی یان نزیکی ◌ 1 لطف، عنایت، احسان 2 حمایت، طرفداری 3 کمک، توجه، التفات 4 تبعیض 5 محبت 6 نفع 7 فرق 8 آرم 9 فاور 10 یادداشت 11 (favours) فاوورس

**favourable** /ˈfeɪvərəbl/ *adjective*, US favorable

1 باش، چاک، قایل‌کەر، (جێی)پەسند، بەقازانج، بەبەهرە، بەسوود، خۆش، سازگار، گونجاو، ئەرێنی، advantageous ،pleasing a ◊ *a favourable reply* :affirmative *a favorable* ◊ *favourable impression* favourably ) auspicious = 2 *wind* ◌ (favourableness *n* ،/ˈfeɪvərəbli/ *adv* مطلوب، خوب، مناسب، مساعد، مثبت

**favoured** /ˈfeɪvəd, US -vərd/ *adjective*

1 (جێی)پەسند، باش، چاک، پەسند، بابەت (ی دڵ)، بەردڵ(کەوتوو): *the favoured candidate* 2 بەردەوک 3 چاک‌تر، باش‌تر، بەلاداشکاو(ە) ◌ 1 مطلوب، مورد پسند 2 دُردانه 3 مرجح

**favourite** /ˈfeɪvərɪt/ *adjective, noun*, US favorite

*adj* 1 جێی پەسند، جێی سەرنج، باش 2 لەبەردڵان، چاک، تایبەتی، ویستراو، بەردڵ(کەوتوو)، بابەت، پەسند، سەرنج‌پێدراو، نزیک، خۆشەویست *n* 1 شت یان مرۆی لەبەردڵ(کەوتوو) یان پەسند، (شتی) هەڵبژاردە، شتی دڵخواز 2 بەردەوک، گلێنەی چاو 3 هیوای تیم، هیوای پێشبڕکێ، چاوەڕوانی بردنەوەی لێ‌دەکرێ ◌ *adj* 1 مطلوب 2 محبوب، مخصوص، مقرب، مورد پسند *n* 1 چیز یا آدم مورد علاقه 2 عزیزدُردانه 3 امید مسابقه

**favouritism** /ˈfeɪvərɪtɪzəm/ *noun*, also favoritism

1 جیاوازی‌دانان 2 لایەنگری، پشتیوانی لەئەندازەبەدەر، جیاوازی‌گەری ◌ 1 تبعیض 2 طرفداری

**favus** /ˈfeɪvəs/ *noun*

کەچەڵی (جۆرێ نەخۆشی پێستی گیرۆ contagious، هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کەڕووە ascomycetous ـەکانەوە (وەک *Trichophyton schoenleinii*)، لاتینی نوێ، لە لاتینەوە "honeycomb") ◌ سعفه‌ی شهدیه

**fawn** /fɔːn/ *noun, adjective*

*n* بەچکە ئاسک، بێچووە گاکێوی، ئاسکۆڵ، کارمامز (یەکساڵان) *adj* قاوەیی ئاماڵ‌زەرد ◌ *n* بچه‌ی گوزن *adj* قهوه‌ای مایل به زرد

**fawning** *adjective*

ڕووبامایی‌یانە، ڕیایی‌بازانە، بە ڕواڵەت (fawningly *adv*) ◌ چاپلوسانه

**fax** /fæks/ *noun*

1 (هەروەها fax machine) دەزگای فەکس، بەڵگەبەر 2 بەڵگەبەر، فەکس (کورتەی facsimile) ◌ 1 (دستگاه) فکس 2 دورنویس

**fax modem** *noun*

فەکس مودێم (کەرەسەیێکی لاوەکی کامپیوتێر بۆ ناردن یان وەرگرتنی زانیاری لە دەزگای فەکسەوە یا کامپیوتێرێکی دیکەوە) ◌ فکس مودم

**fay** = fairy (literary)

**fayre** = fair 3

**fazenda** /fəˈzɛndə/ *noun*

(لە وڵاتانی پۆرتوگالی‌زماندا) زەوی‌وزار یا کێڵگەی بەربڵاو ◌ زمین یا کشت‌زار وسیع

**FBI** /ˌef biː ˈaɪ/ *abbreviation* Federal Bureau of Investigation

ئێف‌بی‌ئای (= نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فێدراڵ، بەڕێوەبەری پۆلیسی فیدراڵی ئەمریکا) ◌ اف‌بی‌آی

**FC** /ˌef ˈsiː/ *abbreviation* Football Club

ئێف‌سی (= یانەی تۆپێن یا تۆپی‌پێ، یانەی فوتبۆڵ، بریتانیا) ◌ اف‌سی

**FCO** /ˌef siː ˈəʊ, ˈoʊ/ *abbreviation* Foreign and Commonwealth Office

ئێف‌سی‌ئۆ (= بەڕێوەبەری دەرەوەیی و هاوبەرژەوەندی، پێکهاتوو لە 1968) ◌ اف‌سی‌او

**FDA** /ˌef diː ˈeɪ/ *abbreviation* Food and Drug Administration

ئێف‌دی‌ئەی (بەڕێوەبەر(ایەتی)ی خۆراک و دەرمان، ئەمریکا) ◌ اف‌دی‌ای

**FE** /ˌef ˈiː/ *abbreviation* further education

ئێف‌ئی (= پەروەردە لە ڕێگای دوورەوە) ◌ اف‌ای

**Fe** symb. the chemical element iron (from Latin ferrum)

**feal** /'fi:əl *noun*, also faithful or loyal
بەوەفا، بەئەمەک، پێزان ◌ وفادار

**fealty** /'fi:əlti/ *noun, pl.* fealties
(مێژوویی) بەوەفایی، بەئەمەکی، پێزانی، وەفاداری vassal یان ئیجارەداری دەرەبەگی سەبارەت بە گەورەکەی ◌ وفاداری، فیالتی

**fear** /fɪə(r), US fɪr/ *noun*
1 ترس، باک، ئەندێش، بیم، خەوف، فەرهەنگڕانی، توقان 2 ئەگەر، شیان، لەوەچوون 3 مەترسی ◌ 1 ترس، بیم، خوف 2 احتمال 3 خطر

**fearful** /'fɪəfl, US 'fɪrfl/ *adjective*
1 ترسناک، ترسێنەر، پڕترس، توقێنەر، ترسەنۆک، ترس‌لێ‌نیشتوو، نگەران، نیگەران: *a* 2 *a fearful glance* ◊ *fearful storm a fearful waste*: (نافەرمی) زۆر خراپ، شپرزە *We made a* ◊ *fearful slum conditions* ◊ *fearful mess of the room* ◌ 1 هولناک، مخوف، ترسو، نگران 2 خیلی بد، وحشتناک

**fearfully** /-fəli/ *adverb*
بە ترسەوە، لە رووی ترسەوە: *We watched fearfully* ◌ با ترس

**fearfulness** /'fɪəflnəs, US 'fɪrflnəs/ *noun*
ترسێنەری، ترسناکبوون، توقێنەریتی ◌ هولناکی، مخوف بودن

**fearless** /'fɪələs, US 'fɪrləs/ *adjective*
بێباک، نەترس، بەدڵ‌وجەرگ، بەزات، شێرکرۆژ، کۆنەکردوو، چاوتوند، بێترس، *a fearless mountaineer* :brave ◌ بی‌باک، بی‌پروا

**fearlessly** /'fɪələsli, US 'fɪrləsli/ *adverb*
بێ‌ترس، بێ‌ترس و لەرز، بێ‌باکانە، نەترسانە ◌ بدون واهمه

**fearlessness** /'fɪələsnəs, US 'fɪrləsnəs/ *noun*
نەترسی، بەجەرگی، بەزاتی، شێرکرۆژی، بێباکی، چاوتوندی ◌ بی‌باکی، بی‌پروایی

**fearsome** /'fɪəsəm, US 'fɪrsəm/ *adjective*
ترسناک، ترسێنەر، توقێنەر، بەترس، ترساوی: *a fearsome monster* ◌ هولناک، مخوف، مهیب

**fearsomely** /'fɪəsəmli, US 'fɪrsəmli/ *adverb*
ترسناکانە، ترسێنەرانە، توقێنەرانە ◌ بە طور هولناک

**fearsomeness** /'fɪəsəmnəs, US 'fɪrsəmnəs/ *noun*
ترسناکی، ترسێنەری، توقێنەری ◌ هولناکی، مخوف بودن

**feart** /'fɪət/ = afraid

**feasance** /'fi:zəns/ *noun*
کردن، بەڕێوەبردن، ئەنجام(دان)، جێبەجێ‌کردن ◌ انجام

**feasibility** /ˌfi:zə'bɪləti/ *noun*
لەکردنهاتوویی، کردارەکی‌بوون ◌ امکان، احتمال

**feasible** /'fi:zəbl/ *adjective*
کردارەکی، لەکردنهاتوو، ڕێ‌تێچوو، لەوەچوو، کردەنی، دەکرێ، باوەڕپێکراو: *a feasible plan* ◌ عملی، ممکن، محتمل، شدنی، قابل قبول

**feasibly** /'fi:zəbli/ *adverb*
لەکردنهاتووانە، بە شێوەیێکی کردەنی ◌ بە طور عملی یا ممکن

**feast** /fi:st/ *noun*
1 سوور، شا(د)ڕۆژ، جەژن، جێژن (دین): *the feast of Christmas* 2 میوانی 3 خۆشی، وەشی ◌ 1 جشن، عید 2 مهمانی 3 لذت

**feast day** *noun*
ڕۆژی جەژن ◌ روز عید

**feaster** *noun*
خۆش‌ڕابوێر، خۆش‌گوزەران، سوورگێر ◌ عیاش

**feasting** *noun*
سوور، بەزم و ڕەزم ◌ جشن

**Feast of Deication** = Hanukkah

**Feast of Tabernacles** = Sukkoth

**Feast of Weeks** = Shavuoth

**feat** /fi:t/ *noun*
کاری گەورە، شاکار، مۆجیزە، پەرجۆ، فەرجوود ◌ شاهکار، معجزه

**feather** /'feðə(r)/ *noun*
1 پەڕ، کۆنک: *a peacock feather* 2 باڵ‌وپەڕ، پەڕوباڵ 3 پەڕی کلاو 4 ریشکۆ ◌ 1 پر 2 پر و بال 3 پر کلاه 4 ریشه

**feather bed** *noun*
دۆشەکی پەڕ (یان پەڕی) ◌ تشک پر

**feather-bedding** *noun*
بەزۆری دامەزراندن ◌ تحمیل استخدام

**feather boa** *noun*
شاڵ‌گەردنی لە پەڕ یان پەڕی یان پەڕین ◌ شال گردن پر

**feather-brain** *noun*
مرۆی عەقڵ‌سووک، گەوج، کەم‌ژیر ◌ آدم سبک‌مغز

**feather-brained** *adjective*
عەقڵ‌سووک، گەوج، کەم‌ژیر، حۆل، کەللەپووچ ◌ سبک‌مغز

**feather duster** *noun*
تۆزسڕە، داری پەڕ، داری پەڕپەسەر ◌ چوب پر

**feathered** /'feðəd, US -ðərd/ *adjective*
پەڕاوی، پەڕەوەر، پەڕدار، ڕازاوە بە پەڕ ◌ دارای پر، آراسته با پر

**feather edge** *noun*

لێوی ناسک، لێواری باریک، دەمی ناسک ۞ لب نازک

**featheredged** *adjective*

لێوناسک، لێواریاریک، دەمناسک ۞ لب‌نازک

**feather-footed** *adjective*

پێ‌پەڕاوی، خاوەنی پای پەڕدار ۞ دارای پاهای پردار

**featheriness** *noun*

سووکی ۞ سبکی

**feathering** *noun*

1 باڵوپەر، پەڕوباڵ، پڕوباڵ 2 پەڕی تیر 3 شتێکی پەڕئاسا ۞ 1 پر و بال 2 پر تیر 3 چیز پرمانند

**featherless** *adjective*

بێ‌باڵوپەڕ، بێ‌پڕوباڵ ۞ بدون پر و بال

**feather stitch** *noun*

تەقەڵی چەپوڕاست یان حەوت‌وهەشتی ۞ کوک زیگزاگی

**featherweight** /'feðəweɪt, US 'feðərw-/ *noun*

1 کێش‌سووک لە نێوان 57 و 53.5 کیلۆگرەم، باپووشکە، پەرکێش 2 مرۆ یان شتی ناگرنگ و بێ‌نرخ ۞ 1 سبک‌وزن 2 آدم یا چیز بی‌اهمیت

**feathery** /'feðəri/ *adjective*

پەڕئاسا، شێوەپەڕ، وەک‌پەڕ، سووک، نەرم ۞ پرمانند، سبک، نرم

**feature** /'fi:tʃə(r)/ *noun*

1 (زۆرتر features) دیم، دەموچاو، روخسار، بیچم، قیافە، دیمە، شێوە 2 تایبەتمەندی، لایەنی دیار، رەوشت، درووف، خەسڵەت، جیاکەرەوە، چۆنیەتی 3 وتاری تایبەتی و گرنگ 4 فیلمی درێژ، فیلمی سەرەکی 5 بەرنامەی تایبەتی یان گرنگ (تەلەفزیۆن، رادیۆ و هتد) 6 نیشانەی تایبەت (زۆرتر لە کۆدا futures) 7 بەشی سەرەکی، بابەتی سەرەکی یان تایبەتی 8 (وەک ناوەڵناو) سەرەکی ۞ 1 صورت، چهره 2 مشخصە، ویژگی، خصیصە، کیفیت 3 مقالەی مهم 4 فیلم بلند 5 برنامەی مهم 6 علامت مخصوص 7 بخش یا موضوع اصلی 8 (صفت‌گونە) اصلی

**feature film** *noun*

فیلمی سەرەکی یان درێژ ۞ فیلم اصلی یا بلند

**featureless** /'fi:tʃələs, US -tʃərl-/ *adjective*

بێ‌تایبەتمەندی، ئاسایی، ناخۆش، ناسەرنج‌راکێش: *The countryside is flat and featureless* ۞ عاری از خصوصیات، بدون ویژگی

**Feb** = February

**febri-** *prefix*

پێشگر: تا، تێ: *febrific* (بنەڕەت: لە *febris* لاتینەوە "fever") ۞ پیشوند: تب

**febricula** /fɪ'brɪkjələ/ *noun*

سووکەتێ، سووکەتا، تای کورت‌ماوە، تا یان تاوتوێی سووک ۞ تب خفیف

**febrific** = feverish

**febrifugal** /fɪ'brɪfjʊg(ə)l/ *adjective*

دژەتا، دژەتێ، تێ‌لابەر، تارەوێن، تابەر ۞ ضد تب

**febrifuge** /'febrɪfju:dʒ/ *noun*

دەرمانی تا، دژەتا، دژەتێ، تێ‌لابەر، تارەوێن، تابەر، antipyretic ۞ داروی ضد تب

**febrile** /'fi:braɪl, US 'feb-/ *adjective*

1 لەئەنجامی تا یان تێ(وە)، لەبەر تا(ولەرز)، تادار، بەتێ، تێ‌دار 2 ورووژاو، پڕجم‌وجۆڵ، چالاک، لەگوڕ، لەجۆش، تاوسەندوو: *a product of her -rile imagination* ۞ 1 تب‌دار 2 هیجان‌زدە، فعال، پرجنب‌وجوش

**February** /'februəri, US -ueri/ *noun*

فێبرەوەری، فێبریوێری، شوبات، رێبەندان، ناوزستان (دووەمین مانگی ساڵ نێوان January و March؛ بنەڕەت: لە *februa* لاتین، لە ناوی جەژنی پاک‌کردنەوە purification کە لەو مانگەدا دەگیرا) ۞ فوریە

**fecal** = faecal

**feces** = faeces

**feckless** /'fekləs/ *adjective*

1 گوێ‌پێنەدەر، نادەربەست، لاسەرلا، ئالۆری، کەمتەرخەم، بێ‌خەیاڵ، نابەرپرسیار 2 لێنەهاتوو، لێنەوەشاو، بەکارنەهاتوو 3 بێ‌ئەنجام، بێ‌ئاکام، بێهوودە ۞ 1 لاابالی 2 بی‌لیاقت 3 بی‌ثمر

**fecklessly** /'fekləsli/ *adverb*

لێ‌نەوەشاوانە ۞ با بی‌لیاقتی

**fecklessness** /'fekləsnəs/ *noun*

1 گوێ‌پێنەدان، کەمتەرخەمی، نادەربەستی، لاسەرلایی، بێ‌خەیاڵی، نابەرپرسیاری 2 لێنەوەشاوی، لێنەهاتوویی ۞ 1 بی‌قیدی 2 بی‌لیاقتی

**fecula** /'fekjələ/ *noun*

نشاستە ۞ نشاستە

**feculence** /'fekjʊl(ə)ns/ *noun*

1 لیلی، قوڕاویبوون، لیخنی، شلوێبوون 2 بەگر، نیشتوو، دورد، خڵتە، بن ۞ 1 تیرگی 2 تەنشست

**feculent** /'fekjʊl(ə)nt/ *adjective*

1 لیل، قوڕاو، لیخن، شلوێ 2 دورداوی، خڵتەدار ۞ 1 تیرە 2 رسوب‌دار

**fecund** /'fi:kənd, US 'fek-/ *adjective*

1 بەپیت، بەبەرهەم، زەنوێر، بەبرشت، مایەدار 2 پڕزا، بەبەرەکەت، بەزا، زۆرخەرەوە، زەوزۆک، زاڵۆک، پڕزاوزێ 3 داهێنەر prolific ۞ 1 بارور 2 پرفرزند 3 خلاق

**fecundation** /ˌfi:kʌn'deɪʃn, US ˌfekən-/ *noun*

1 چاک‌کردن، چاکردن، پیتاندن 2 بەپیتی،

بەبەرهـەمی، زەنـوێری، بەبرشـتی، مایـەداری 3 ناوسی ۞ 1 تلقیح 2 باروری 3 آبستنی

**fecundity** /fɪ'kʌndəti/ *noun*

1 بـەپیتی، بەبەرهـەمی، زەنـوێری، بەبرشـتی، مایـەداری 2 پـڕزایی، بەبەرەکـەتی، بـەزایی، زۆرخستنەوە، زۆرکی، پڕزاوزێیی 3 داهێنـەری، داهێنەریتی ۞ 1 باروری 2 پرفرزندی 3 خلاقیت

**fed** /fed/ = past and past participle of feed

**Fed** /fed/ *noun*

ئەندام یان فەرمانبەری ئێف‌بی‌ئای ۞ عضو یا مأمور اف‌بی‌آی

**fedayeen** /ˌfedə'jiːn, US fə'dɑːjiːn/ *noun*

گریلاکانی ئیسلامی، ب.ت. بەدژی ئیسرائیل ۞ فدائیان

**federal** /'fedərəl/ *adjective*

1 فیدراڵ، ناوەندی (لەچاو حکومەتی ستانی یان خۆجێیی): *state and ◊ a federal law* 2 *federal income taxes* (میژوویی، Federal) سەربە هەرێم یان ئەیالەتە باکوورییەکان لە شەڕی نێوخۆیی ئەمریکادا ۞ 1 فدرال، مرکزی 2 فدرال

**Federal Bureau of Investigation** *noun*

ئێف‌بی‌ئای: دەزگای لێکۆڵینەوەی فیدراڵ، نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵ، بەڕێوەبەری پۆلیسی فیدراڵی ئەمریکا (بەرپرسی لێکۆڵینەوەی پێشێل کردنی قانوونی فیدراڵ و پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی) ۞ اف‌بی‌آی

**federal court** *noun*

دادگای فیدراڵ ۞ دادگاه فدرال

**federalism** /'fedərəlɪzəm/ *noun*

1 فیدراڵگەری، فیدراڵیزم، هاوگیرگەری، هاوبەندی‌خوازی، هاوبەندی‌گەری 2 حکومەتی فیدراڵیستی 3 (Federalism) بنەماکانی فیدراڵیستی ۞ 1 فدرالیسم 2 حکومت فدرالیستی 3 اصول فدرالیستی

**federalist** /'fedərəlɪst/ *noun, adjective*

*n* فیدراڵگەر، هاوبەندی‌خواز، هاوگیری‌گەر، هاوبەندی‌گەر *adj* هاوبەندی‌گەرانە، فیدراڵیستی ۞ *n* فدرالیست *adj* فدرالیستی

**federalization** /fedərelɪ'zeɪʃn/ *noun*

هاوبەندانـدن، هاوگیرانـدن، پێکهێنانی وڵاتە یەکگرتووەکان ۞ فدرالیزاسیون

**federally** /'fedərəli/ *adverb*

فیدراڵانە، بە شێوەیێکی فیدراڵی: *federally funded health care* ۞ به طور فدرال

**Federal Reserve bank** *noun*

بانکی فیدراڵ (ی ئەمریکا) ۞ بانک فدرال

**Federal Reserve Board** *noun*

دەستەی بانکی فیدراڵ (پێکهاتوو لە 7 ئەندام) ۞ بورد بانک فدرال

**Federal Reserve System** *noun*

سیستمی بانکی فیدراڵ (سیستمی بانک‌داری ناوەندی ئەمریکا پێکهاتوو لە 12 بانک) ۞ سیستم بانکی فدرال

**federate** /'fed(ə)rət/ *adjective*

یەکگرتوو، هاوپەیمان، هاوبەند، federated ۞ متحد

**federation** /ˌfedə'reɪʃn/ *noun*

1 یەکێتی، یەکگرتوویی، هاوگیری، هاوبەندی، یەکگیری، فیدراسیۆن: *the Russian Federation ◊ the International Tennis Federation* 2 کۆمەڵێ لە هەرێمە فیدراڵەکان ۞ اتحاد، فدراسیون

**federative** /'fedəreɪtɪv/ *adjective*

فیدراڵی: *a federative republic* (*federatively adv*) ۞ فدرالی

**fedora** /fɪ'dɔːrə/ *noun*

فیدۆرا (جۆرێ کڵاو، لە ناوی دراماى Victorien Sardou) ۞ فدورا

**fed up** *adjective*

1 (نافەرمی) هیلاک، ماندوو، شەکەت 2 وەڕەس، جاڕز، عاجز، بێزار، منج: *You look fed up. What's the matter?* ۞ 1 خسته 2 بکر

**fee** /fiː/ *noun*

1 کرێ، مز، حەق، زەحمەتانە، کاڵەدرانە، دەس‌خۆشانە 2 ڤیزیت (پزشکی) 3 خوێندنانە، مانگانە، کرێی مانگانە 4 وەکیلانە، پارێزەرانە، حەقی پارێزەر 5 (میژوویی، ماف) زەویزارێ کە کەسێ لە برێتی هێندێ راژە دەیگرێ یان دەیکێڵێ ۞ 1 دستمزد، حق‌الزحمه 2 ویزیت 3 شهریه 4 حق‌الوکاله 5 فی

**feeb** *noun*

مرۆی دەبەنگ یان گێژ ۞ آدم کودن

**feeble** /'fiːbl/ *adjective*

1 کز، لاواز، جووقن، جیقن، بێ‌هێز، پەککەوتە، لاکەوتە، داکەوتوو، سست، بێ‌دەس، بەسزمان، دەستەوسان 2 لێنەوەشاو، لێنەهاتوو 3 ناکاریگەر ۞ 1 ضعیف، نحیف، عاجز 2 بی‌لیاقت 3 غیرمؤثر

**feeble-minded** *adjective* (feebler/ 'fiːblə(r):, US /feeblest /'fiːblɪst/)

1 دەبەنگ، گەمژە، گێل، کاس، ئەقڵ‌سووک 2 گەوج ۞ 1 ابله، خل، سبک‌مغز 2 احمق

**feeble-mindedness** *noun*

دەبەنگی، گێژی، گەمژەیی، کاسی، گێلی، ئەقڵ‌سووکی ۞ کودنی

**feebleness** /'fiːblnəs/ *noun*

1 کزی، لاوازی، بێ‌هێزی، سستی، بێ‌تاوی، پەککەوتەیی، داکەوتوویی، بێ‌دەسی، بەیدەسی، دەستەوسانی 2 لێنەوەشاوەیی، لێنەهاتوویی ۞ 1 ضعف، عجز 2 بی‌لیاقتی

**feebly** /'fiːbli/ *adverb*

به لاوازی‌یەوە، بە کزی‌یەوە: *He shook his head feebly* ◌ با ضعف

**feed** /fi:d/ *noun*

1 نان، خـۆراک، چێشت، ژەم، جـەم، وەختی نان(خواردن) 2 تفاق، ئالیک، کاوجۆ، ئالف 3 لـەوەڕین، چـەرین 4 دەزگـا یـان بـۆری دەرخوارددان (تکنیکی)، دەزگای بەدەمۆکردن 5 ماک، مایە ◌ 1 غـذا، وعـدەی غـذا 2 علوفـه 3 چریدن 4 لولەی تغذیه 5 مواد

**feedback** /'fi:dbæk/ *noun*

1 دەرخوارددانـەوە 2 کاردانـەوە، پەرچـەکردار، رەنـگ‌دانـەوە 3 بۆچـوون، را ◌ 1 بـازخورد، پس‌خورد 2 واکنش، بازتاب 3 نظر

**feedbag** /'fi:dbæg/ = nosebag

**feeder** /'fi:də(r)/ *noun*

1 پێدەر، دەرخـواردەر، ـخـۆر (لـە لێکـدانا) 2 دەفری خۆراک‌پێدان، دەفری خۆراک‌کردنەسەر، کاسـە، دانـەخۆری، ئـاخور (بـۆ باڵـندە و گیانـەوەرەکان) 3 لەوەڕێنـەر، چەرێنـەر 4 دەرخـوار(د)دەرە، دەزگـا یـان ئـامێری دەرخـوارددان 5 دۆلاش، کۆرەگـە، کـۆل، پلووسک، دولاب 6 بەرسینگ 7 شووشەی شیر (منـاڵ) 8 (وەک ئاوەڵـناو) لاوەکـی، لاڕێ 9 چۆمـەڵ، زێ، لاچـۆم، رووبـاری لاوەکـی 10 رێگای لاوەکی، لاڕێ 11 (رێی ئاسن و هتد) هێڵی لاوەکی، لق ◌ 1 ـخور، خوراندگر 2 فیـدر 3 چراننده 4 ابزار خوراندگر 5 نـاودان 6 پیـشبند 7 بطری شیر 8 (صفت‌گونه) فرعی 9 رود فرعـی 10 جادەی فرعی 11 خط فرعی

**feeding** /'fi:dɪŋ/ *noun*

دەرخوارددان: *breast/bottle feeding* ◌ تغذیه

**feeding-bottle** *noun*

شووشەی شیر ◌ بطری شیر

**feeding ground** *noun*

خۆرگە، دانگە، خۆراک‌گا ◌ خوراک‌گاه

**feedstuff** = fodder

**feel** /fi:l/ *noun*

1 بەرکـەوتن، دەس‌لێـدان 2 هەسـت، هەسـت‌پێکـردن، ئاگـاکردن 3 کـەش (بنەڕەت‌ئەڵمانی رۆژاوایی) ◌ 1 لمس، بـاوایی 2 حس، احـساس 3 فضا

**feeler** /'fi:lə(r)/ *noun*

1 شاخ، هەستەوەر، شاخەهەست 2 هەست‌پێکەر 3 قـسەتاقی‌کردنـەوە، پێـشنیار یـان پرسـیاری دۆزین (بۆ دەرخـستنی بیروڕای کەسێ) ◌ 1 شاخک 2 احـساس‌کننده 3 سخت استمزاجی

**feeler gauge** *noun*

مەوداپێو، کەلێن‌پێو ◌ فاصله‌سنج

**feeling** /'fi:lɪŋ/ *noun, adjective*

*n* 1 هەسـت، هـۆش، ئاگـا، هەسـت‌پێکـردن، لێکـەوتن، بەرکـەوتن 2 بـاوەڕ، بۆچـوون، را 3 تێگەیشتن، پێزانین 4 دڵنەرمی، هاوسۆزی، سۆز 5 کەش، ئەتمۆسفێر 6 (feelings) هەست‌وسۆز، کڵ‌وکۆ، رەگی دڵ *adj* بەهەست، هەست‌بزوێن، کارتێ‌کەر، بەسـۆز، دڵـنەرم، دڵـسۆز ◌ *n* 1 حس، احـساس، لامـسه 2 نظر 3 فهـم 4 شـفقت، عاطفه، هم‌دردی 5 جـو 6 (feelings) احـساسات *adj* احساس‌برانگیز، شفیق، رئوف

**feeling of inferiority** *noun*

هەستی خۆبەکـەم‌گـرتن یـان خۆپـێ‌کـەمی ◌ احـساس حقارت

**feelingly** /'fi:lɪŋli/ *adverb*

بە هەستەوە ◌ با احـساس

**feeling of scarcity** *noun*

هەست بە کـەمی (کردن) یـان خۆپێ‌کـەمی ◌ احـساس کمبود

**fee-paying school** *noun*

خوێندنگای تایبەتی ◌ مدرسەی خصوصی

**fee splitting** *noun*

بەشێ لە حەقی پزشک یان پارێزەرێ کە دەدرێ بە کەسێکی تر (بۆ نموونە بە دەرمان‌فرۆشێ)، بەشەحەقی ◌ فی اسپلیتینگ

**feet** = plural form of foot

**feet** *noun*, have feet of clay

(بوونی) خاڵی لاوازی یان عەیب ◌ نقطه‌ضعف

**fee tail** *noun, pl.* fees tail

مڵکی تەرخانە یان تەرخان‌کراو ◌ ملک موقوفه

**feeze** *noun*

تـرس، دڵـەڕاوکـێ، وورووژاوی، شـڵەژاوی ◌ اضـطراب، هیجان‌زدگی

**Fehling's solution** *noun*

گـیراوەی فێهلینـگ یـان فالینـگ(ـز): جـۆرێ گیراوەی شینی Rochelle salt و سولفاتی مس (بنەڕەت: لە ناوی کیمیازانی ئەڵمانی Hermann Fehling (مەرگ 1885) ◌ محلول فهلینگ

**feigned** *adjective*

بـەدرۆ، ناڕاسـتەقینە، درۆ، دەسـکرد، خۆپیـشاندەرانە، سـاختە، خـۆوالێکردوو، fictitious ◌ تصنعی، غیرحقیقی، ساختگی

**feigner** *noun*

ریایی‌باز، دووڕوو ◌ متظاهر، ریاکار

**feigningly** *adverb*

ریـایی‌بازانـە، دووڕووانـە، خۆپیـشاندەرانە ◌ ریاکارانه، متظاهرانه

**feijoa** /feɪ'(d)ʒəʊə, fɛ-, fi:-, -'jəʊə/ *noun*

1 میـوەیێکی خـۆراکی سـەوز، شـێوەی guava دەدا 2 داری ئـەم میوەیـە، رەسـەنی گـەرمێنانی ئەمریکای باشووری [توخم *Feijoa*] ◌ فیجوا

**feint**[1] /feɪnt/ *noun*

1 پەلاماری فریودەرانە، هێرشی فێڵاوی، هێرشی واخۆپیـشاندەرانە (لـە شـەڕ، شەڕەمـشت و شـیرەوانی‌دا) 2 فـێڵ، کەڵـەک، فریـو 3

واخۆنواندن، واخۆنیشاندان ◊ 1 حملەی انحرافی 2 کلک، حقه 3 تظاهر

**feint²** /feɪnt/ *adjective*
(کاغەز) ڕیڕی، هێلاوی، هێڵ‌هێڵ، خەت‌خەت ◊ خط‌دار

**feist** *noun*
تولە، سەگی چکۆلە، تووتک ◊ فیست

**feisty** /ˈfaɪsti/ *adjective* (feistier, feistiest)
1 پڕجم‌وجۆل، بەگوڕ، بەگوڕزم، بەکار، پڕجم‌وجۆل، چالاک 2 fidgety بەبڕیار، سوور، پتەو، شێلگیر 3 ڕووتاڵ، ڕووگرژ، خوێنتاڵ (feistiness *n*؛ feistily *adv*) ◊ 1 پرجنب‌وجوش، پرانرژی، فعال 2 مصمم 3 بدعنق

**felafel** /fəˈlaf(ə)l, US -ˈlɑ:-/ = falafel

**feldspar** /ˈfeldspɑ:(r)/ *noun*, also felspar
فێلدسپار: کانەبەردێکی سپی یا سوور کە ئالومینیۆم و سیلیکاتەکانی تری تیایە؛ و پێکهێنەرێکی بنەڕەتی نزیکەی هەموو تەختەبەردە کریستالینەکانە (feldspathic *adj*) ◊ فلدسپار

**felicitations** /fəlɪsɪˈteɪʃnz/ *noun, pl.*
پیرۆزبایی، چاوڕۆشنی (پێ‌وتن، congratulations؛ بنەڕەت: لە -*felicitat* "make شادکردن" late Latin *felicitare* "happy") ◊ تبریک، تهنیت

**felicitator** *noun*
پیرۆزباییبێژ ◊ تبریک‌گوینده

**felicitous** /fəˈlɪsɪtəs/ *adjective*
1 بەجێ، گونجاو، لەبار، بەرێ‌وجێ، لەجێی خۆی، پێویست 2 *a felicitous remark* :apt، *felicitous weather* :delightful ,pleasant - (felicitously /fəˈlɪsɪtəsli/ *adv*: گونجاوانە، بە شێوەیەکی بەرێ‌وجێ، بەرێ‌وجێیانە؛ felicitousness *n*: بەجێبوون، گونجاوی، لەباری، بەرێ‌وجێ‌بوون، پێویستی) ◊ مناسب، به مورد، مقتضی

**felicity** /fəˈlɪsəti/ *noun, pl.* felicities
1 شاگەشکەیی، سەرخۆشی، سەرمەستی، شادی، دڵخۆشی، خۆشی 2 ڕەوانی، زمان‌پاراوی، خۆش‌ڕاوێژی: *The story is told with great felicity of style* (بنەڕەت: لە *felicite* فەرەنسی کۆن، لە *felicitas* لاتین، لە *felix* -*felic* "happy") ◊ 1 وجد، شعف، شادمانی، خوشایندی 2 بلاغت

**felid** /ˈfi:lɪd/ *noun*
(گیانەوەرێ) لە تیرەی پشیلە، گوانداران یان شیردەرانی خێزانی پشیلە، لە خێزانی پشیلە (Felidae؛ بنەڕەت: لە *Felidae* لاتینی نوێ، لە *feles* لاتین "پشیلە") ◊ از خانوادهٔ گربه

**Felidae** *noun. pl.*
تیرەپشیلە، خێزانی پشیلە ◊ گربه‌سانان

**feline** /ˈfi:laɪn/ *noun, adjective*
*n* (گیانەوەرناسی) تیرەپشیلە، پشیلە یان گیانەوەرێکی تر لە خێزانی پشیلە *adj* پشیلەئاسا، پشیلەیی، کتکی، شێوەپشیلە (felinely *adv*؛ بنەڕەت: لە *felinus* لاتین، لە *feles* "پشیلە cat") ◊ *n* گربه‌سان *adj* گربه‌وار

**feline distemper** = panleukopenia

**feline panleukopenia** = panleukopenia

**felinity** /fɪˈlɪnɪtɪ/ *noun*
پشیلەئاسایی ◊ گربه‌صفتی

**fell¹** /fel/ *adjective*
1 دڕ، دڕندە، هۆف، دڵڕەق، کوشندە، کاری، توند، قورس 2 پڕمەترسی، مەترسی‌دار، تێکدەر، وێران‌کەر ◊ 1 سبع، مهلک، مرگبار 2 خطرناک، مخرب

**fell²** /fel/ *noun*
1 داربڕی 2 بڕی ئەو دارەی کە (لە وەرزێکدا) بڕدراوەتەوە، بڕشتە ◊ 1 چوب‌بری 2 مقدار چوب بریده‌شده

**fell³** /fel/ *noun*
کەوڵ، چەرم، تەختەپێست، پێستە (لەگەڵ مووەکەی) ◊ پوست

**fell⁴** /fel/ *noun*
زەویبوورە یان بەیار، دەشتەبوورە، تەپەلان، زوورکەلان، گردەلان (لە باکووری ئینگلتەرە) ◊ زمین بایر، تپه‌ماهور

**fell⁵** /fel/ = past of fall

**fellah** /ˈfelə/ *noun, pl.* fellahin /-ˈhi:n/, from Arab. *fallāḥ*
جووتیار، وەرزێر، جووتبەندە، کشتکار ◊ فلاح، برزگر

**fellatio** /fəˈleɪʃiəʊ, US -ʃioʊ/ *noun*, also fellation
چووک‌لستنەوە (مژین و لستنەوەی ئەندامی نێرینەی پیاو؛ fellator *n*) ◊ قضیب‌لیسی

**felled** *adjective*
بڕاو ◊ قطع‌شده

**feller** *noun*
پیاو، مێر ◊ مرد

**fellmonger** /ˈfelmʌŋgə(r)/ *noun*
چەرم‌فرۆش، پێستەفرۆش، کەوڵ‌فرۆش ◊ پوستین‌فروش

**fellness** *noun*
دڕی، دڕندەیی، هۆفیگەری ◊ سبعیت

**felloes** /ˈfeləʊz/ *noun, pl.* also fellies /ˈfeliz/, *pl.* felly
کەمەی rim ی دەرەوەی چەرخ یان پێچکەیێ، ئەوەی کە میل یان پەرەکانی پێوەیە، کەلله، تەوق ◊ طوقهٔ بیرونی چرخ

**fellow** /ˈfeləʊ, US ˈfeloʊ/ *noun*
1 کوڕ، پس 2 پیاو، مێر، بنیادەم، کابرا، یارۆ 3

رفیق، دۆست، هەوال، هاوڕێ 4 شەریک 5 ـ هاو (لە لێکدانا) 6 ئەندام (کۆمەڵ یان کۆلێژێکی گرنــگ) 7 خوێنــدکاری بــورس، بورســییە 8 ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی هێندێ زانکۆ 9 ئەندامی کۆمەڵەی زانایان 10 جووت، لف، تا، هاوتا 11 دۆستی کوڕ ◌ 1 پسر 2 مرد، شخص 3 رفیق، دوست 4 شریک 5 هم- 6 عضو 7 بورسیه 8 عضو هیأت مدیرەی برخی از دانشگاه‌ها 9 عضو انجمن علما 10 لنگه، نظیر 11 دوست‌پسر

**fellow-citizen** *noun*

هاوشاری، هاوبازێڕی، هاوولاتی، هاونیشتمانی ◌ هم‌شهری

**fellow-countryman** *noun*

هاوولاتی، هاوزێد ◌ هم‌میهن

**fellow-feeling** *noun*

هاوسۆزی، خەمخۆری، دڵسۆزی، هاوهەستی ◌ همدردی، هم‌دلی

**fellow-player** *noun*

هاویاری، هاوکایە ◌ هم‌بازی

**fellowship** /ˈfeləʊʃɪp, US -loʊ-/ *noun*

1 دۆستایەتی، رفێقایەتی، هاوڕێیی، هاوسۆزی، خەمخۆری: *They offer students counselling and fellowship* 2 کۆمەڵە، کۆڕ، ئەنجومەن 3 ئەندامێتی membership 4 بارپوی خوێندن، باربوی توێژینەوە یا لێکۆڵینەوە، یارمەتی دارایی، بورس ◌ 1 رفاقت، هم‌دردی 2 انجمن، جمعیت 3 عضویت 4 کمک‌هزینەی تحصیلی یا پژوهشی، بورس

**fellow-student** *noun*

هاوشاگردی، هاووانە ◌ هم‌شاگردی

**fellow-traveller** *noun*

1 هاوسەفەر 2 لایەنگر (پارتییەکی رامیاری ب.ت. حزبی کۆمۆنیستی، هەڵبەت ئەندامیش نییە؛ (fellow-travelling *adj* ◌ 1 هم‌سفر 2 هوادار

**fellow-worker** *noun*

هاوکار ◌ همکار

**fell race** *noun*

پێشبڕکێی راکردن لە دەشت ◌ مسابقەی دوی صحرانوردی

**felly** = felloes

**felo-de-se** /ˌfiːləʊ deɪ ˈseɪ, US ˌfɛ-/ *noun, pl.* felos de se

خۆکوژی، suicide (بنەڕەت: لە ئانگلۆ ـــ لاتینەوە) ◌ انتحار

**felon**[1] /ˈfelən/ *noun, adjective*

*n* تاوانکار، گوناهکار *adj* (کۆن) زاڵم، خراپ، بێبەزەیی ◌ *n* جانی *adj* ظالم، بی‌رحم

**felon**[2] /ˈfɛlən/ = whitlow

**felonious** /fəˈləʊnɪəs/ *adjective*

تاوانکارانە، تاوانکار، گوناهکار، villainous: **felonious assault** (feloniously /fəˈləʊnɪəsli/ *adv* ; feloniousness *n*) ◌ جنایتکارانه، جانی

**felonry** /ˈfelənrɪ/ *noun*

داروودەستەی تاوانکاران ◌ باند جنایتکاران

**felony** /ˈfelənɪ/ *noun, pl.* felonies

تاوان، گوناهی کەتن، خراپی، بەدکاری: *a charge of felony* ◌ جنایت، شرارت

**felsic** /ˈfɛlsɪk/ *adjective*

(زەویناسی) سەربە کۆمەڵێ لە کانەکانی رەنگ‌ڕۆشن کە بریتین لە feldspar، quartz و muscovite (بڕوانە mafic) ◌ فلسیک

**felspar** /ˈfɛlspɑː/ = feldspar

**felt**[1] /felt/ *noun, adjective*

*n* لمەد، لباد، نمەد، تات، کولاو، کولاف، تەحت، لوا: *adj a felt hat* لمەدی، تاتی، نمەدی ◌ *n* نمد *adj* نمدی

**felt**[2] /felt/ = past and past participle of feel

**felt hat** *noun*

کلاوی لمەدی یان لبادی، تەپلە، کولاف ◌ کلاه نمدی

**felting** *noun*

لمەد دروس‌کردن، نمەدمالی، لبادگەری، لمەدگەری ◌ نمدسازی

**felt-maker** *noun*

لمەدگەر، کارگەچی، نمەدمال، لبادگەر ◌ نمدساز

**felt-pen** *noun*

ماژیک، پێنووسی لمەدی ◌ ماژیک

**felt-tip pen** = felt-pen

**felucca** /fɛˈlʌkə/ *noun*

فێلوکا (جۆرێ کەشتی کەنارەکانی دەریای نێوەڕاست) ◌ فلوقه، فلوکا

**felwort** *noun*

(رووەکناسی) جۆرێ gentian ی گیاجاری وشک کە پاییزان گوڵی مۆر mauve دەگرێ [*Gentianella amarella*] ◌ نوعی گیاه

**fem** = 1 female 2 feminine

**female** /ˈfiːmeɪl/ *adjective, noun*

*adj* 1 مێ، مێینە، مێوینە، ما، مێچکە، ماینە: *female reproductive organs* 2 سەربە ژن یا ژنان یا کچ: *a -male student/employee/artist* : *Two of the candidates must be female* ◊ 3 (تەکنیکی) مێ(و)، وەرگر *n* 1 دێل، ما، ماکەر، گیانەوەر یان رووەکی مێ(یە) 2 ژن: *More -ales than males are employed in the factory* (femaleness *n*) ◌ *adj* 1 ماده، مؤنث 2 وابسته به زن یا زنان 3 ماده *n* 1 حیوان یا گیاه ماده 2 زن

**female circumcision** *noun*

خەتەنەی ژن ◌ خَتنەی زن

**female condom** *noun*
جیر یان کاندۆمی ژن (دەخرێتە نێو شەرمی‌یەوە) ۞ کاپوت زن

**feme covert** /fi:m 'kʌvət/ *noun*
(مێژوویی، ماف) ژنی بەمێرد ۞ زن شوهردار، مُحصنه

**feme sole** /fi:m 'səʊl/ *noun*, also femme sole
(مێژوویی، ماف) ژنی بێ‌مێرد ۞ زن بی‌شوهر، غیرمحصنه

**femicide** /'femɪsaɪd/ *noun*
ژنکوژی، کوشتنی ژن ۞ زنکشی

**feminine** /'femənɪn/ *adjective, noun*
*adj* 1 ژنانە، سەربە ژنان، ژنئاسا 2 (ڕێزمان) مێ *n* 1 وشە یان زایەندی مێیینە 2 (the feminine) ڕەگەزی ژن (*n* :femineity (femininely *adv* ۞ *adj* 1 زنانه، وابسته به زنان 2 مؤنث *n* 1 صورت مؤنث 2 جنس زن

**femininity** /ˌfemə'nɪnəti/ *noun*
ژن بوون، ژنایەتی، ژنیتی، مێیینەتی، هەڵسوکەوتی ژنانە، effeminacy، womankind ۞ زن بودن، زنانگی، تأنیث

**feminism** /'femənɪzəm/ *noun*
1 ژنباوەڕی (باوەڕێ کە ژنان دەبێ هەمان ماف و دەرفەتی (چ لەباری قانوونی، رامیاری، کۆمەڵایەتی، ئابووری و هتد) پیاوانیان هەبێ 2 بزووتنەوەی ئازادی ژنان (feminist /'femənɪst/ *n, adj* :*n* ژنباوەڕ *adj* ژنباوەڕانە، لایەنگری بزووتنەوەی ژنان (feministic *adj*) ۞ فمینیسم

**feminization** *noun*
کردنەژنانە، ژناندن، کردنەمێیینە، مێیاندن ۞ مؤنث‌سازی

**femme** /fɛm/ *noun*, also fem
بانپانۆکێ‌باز، ژنی هاوڕەگەزباز ۞ زن هم‌جنس‌باز

**femme fatale** /ˌfæm fə'tɑ:l, US ˌfem fə'tæl/ *noun, pl.* femmes fatales pronunc. same
(فەڕەنسی) ژنی ئەفسووناوی، شارشێوێنکە، بەڵا ۞ فتانه، شهر آشوب

**femoral artery** *noun*
خوێنبەری ڕانی ۞ سرخرگ رانی

**femto-** /'fɛmtəʊ/ *prefix*
پێشگر: ئاماژە بە فاکتۆری $10^{-15}$ :*femtosecond* (بنەڕەت: لە *femten* دانمارکی یان نۆروێژی "پازدە") ۞ پیشوند: اشاره به فاکتور $10^{-15}$

**femur** /'fi:mə(r)/ *noun, pl.* femurs or femora /'fɛm(ə)rə/
1 (توێکاری) ئێسکی ڕان، ئێسکەڕان، گردەڕان، کولی‌مل 2 (گیانەوەرناسی) سێیەم کەرتی لاقی مێروو و هێندێ گیانەوەری جومگەدار، ڕانە (*adj* /'femərəl/ femoral: ڕانی، سەربە یان پێوەندی بە femur ـەوە هەیە؛ بنەڕەت: لە femur -femor لاتین "thig") ۞ 1 استخوان ران، فَخذ 2 فمور

**fen**[1] /fen/ *noun*
1 زۆنگاو، زەلکاو، چاملۆر، زەل، زنە 2 (the Fens) زەوی‌وزاری زۆنگاوی ناوچەی کەمبریج ۞ 1 مرداب، باتلاق 2 فن

**fen**[2] /fen/ *noun, pl.* same
یەکەی پارەی چین، بەرامبەر بە سەدیەکی yuan ۞ فن

**fenberry** = cranberry

**fence**[1] /fens/ *noun*
1 حەوشە، حەسار، دیوار، تەردە، پەرژین، کەناری، سینچ، تان، نافبریک، کونگی، چیل، شوورە، تەیمان، چیلە، ڕیتاڵ، تۆڕ 2 شیربازی، شمشێرەوانی 3 (سوارکاری) کۆسپ ۞ 1 حصار، نرده، پرچین 2 شمشیربازی 3 مانع

**fence**[2] /fens/ *noun*
ماڵکڕەوە، بنەدز (= کەسێ کە شتی دزیتی دەکڕێ و دەفرۆشێتەوە) ۞ مال‌خر

**fenced** *adjective*
دەورگیراو، پەرژین‌کراو، پەرژین‌بەند، تەیمان‌لێدراو ۞ محصور

**fenceless** *adjective*
بێ‌پەرژین، بێ‌تەیمان، بێ‌شوورە، بێ‌تەردە ۞ بی‌حصار، بدون نرده

**fencer** /'fensə(r)/ *noun*
شیرباز، شمشێرەوان ۞ شمشیرباز

**fencible** /'fɛnsɪb(ə)l/ *noun*
1 گونجاو بۆ پەرژین(کردن)، بۆ پەرژین(کردن) دەبێ 2 شیاوی بەرگری، لەبەرگری‌هاتوو، پاراستەنی 3 (مێژوویی) سەربازی سەربە نیمچەلەشکری بریتانیا، تەنیا بۆ خزمەت لە نێوخۆی وڵاتدا ۞ 1 مناسب برای نرده‌کشی 2 قابل دفاع 3 فنسیبل

**fencing** /'fensɪŋ/ *noun*
1 شیربازی، شمشێرەوانی 2 پەرژین(کردن)، تەردەلێدان، شوورەبۆکردن ۞ 1 شمشیربازی 2 نرده(کشی)

**fender** /'fendə(r)/ *noun*, also mudguard
1 پارێزە، قەڵغان، سپەر 2 لێواری خوارەوەی ئاگردان، پەرژینی بەردەم ئاگردان 3 لاپارێز، زەربەگێرەوە (کەشتی) 4 قوڕگر، قوڕگیر (سەر پێچکەی ماشێن) ۞ 1 حفاظ، سپر 2 نرده‌ی جلو شومینه 3 دَفرا 4 گل‌گیر

**fender bender** *noun*
ڕووداو یان پێکاکێشانی چکۆلە (ماشێن) ۞ تصادف جزئی

**fenestella** /ˌfɛnɪ'stɛlə/ *noun*

(بیناسازی) پەنجیرۆکە (بنەرەت: لە لاتینەوە، چکۆلینراوی fenestra "پەنجیرە") ◌ فنیستیلا

**fenestra** /fɪ'nestrə/ *noun, pl.* fenestrae /-triː/

1 (توێکاری و گیانەوەرناسی) دەلاقە، کون، پەنجیرە، روونەخاڵ: کونێکی چکۆلە لە ئێسکیدا، ب.ت. هەرکام لە دووانەکەی گوێی نیوەڕاست (fenestra ovalis و fenestra rotunda) و گوێی نێوەوە؛ خاڵ یان پنکەیێکی تەنک یان روون (وەک لە باڵەکانی هێندێ پەپوولە یان پەپوولەی شەوگەڕ moth) 2 (پزشکی) کونێکی دەسکرد 3 (رووەکناسی) خاڵ، پنکە، داغ: کون یان بۆشایی لە پەردەی رووەکیدا 4 دەلاقە، کون، پەنجیرە ◌ 1 روزنە، سوراخ 2 سوراخ مصنوعی 3 منفذی در غشای گیاهی 4 سوراخ، پنجره

**fenestral** /fɪ'nestrəl/ *adjective*

دەلاقەیی، سەربە یان پێوەندی بە fenestra ەوە هەیە ◌ وابسته به روزنه

**fenestrate** /'fenəstrət, US fɪ'nestrət/ *adjective*, also fenestrated /'fenə,streɪtɪd, US fɪ'nestreɪtɪd/

(گیانەوەرناسی و رووەکناسی) دەلاقەدار، کونکون ◌ روزنەدار

**fenestration** /,fenɪ'streɪʃ(ə)n/ *noun*

1 کونتێبوون، کونتێکەوتن، کونبوون، کون 2 پەنجیرەبەندان ◌ 1 سوراخشدگی، سوراخ 2 فنستراسیون

**feng shui** /,feŋ 'ʃuːi, US ,fʌŋ 'ʃweɪ/ *noun*

(چینی) ئاو و با ◌ فنگ شوئی

**Fenian** /'fiːniən/ *noun*

1 دانیشتووانی کۆنی ئیرلەند، بەرگریوانانی دوڕگەی ئیرلەند لە سەدەکانی دوو و سێی زایینیدا 2 فینیەن (ئەندامی ڕێکخراوەیێ کە لە 1850 لە ئەمریکا و ئیرلەند بە مەبەستی دوایی‌هێنان بە دەسەڵاتی بریتانیا بەسەر ئیرلەندا دامەزرا) 3 (ب.ت. لە ئیرلەندی باکووری) قسەیەکی سووکە بۆ کاتۆلیکێ (لە féne ئیرلەندی کۆن، ناوی گەلێکی کۆنی ئیرلەند، لەگەڵ fiann، fianna دەستەی شەڕکەران" بە هەڵە گیراوە، ب.ت. سەربازانی پادشای ئەفسانەیی Finn MacCool) ◌ فینین

**fenland** /'fenlænd, US -lənd/ *noun*. also fenlands

زۆنگەلان، زەلستان، زۆنگستان ◌ زمین متشکل از باتلاقها

**fennec** /'fenek/ *noun*

جۆرێ ڕێوی چکۆلەی ئەفریکای باکووری و دەشتەکانی عەرەبستان، بە گوێی درێژ و تیژەوە [Vulpes zerda] (بنەرەت: بە ڕێگای عەرەبی لە fanaj ،fanak فارسی) ◌ فنک

**fennel** /'fenl/ *noun*

(رووەکناسی) ڕەزیانە، ماردۆس، هەبۆسان [Ferula communis ،Foeniculum vulgare] (giant fennel)، و جۆرەکانی تر ] ◌ رازیانه

**fennel giant** *noun*, also giant fennel

جەقەلۆ، کەمێر، هەنوان، هەنگوان، کەماهەورامانییە ◌ باریجه، آنقوزه

**fenny** = swampy

**fenugreek** /'fenjʊgriːk/ *noun*

کاخلی، قاقلی، شملی [-Trigonella foenum graecum] ◌ شنبلیله

**feoff** = fief

**feoffee** /fe'fiː, US fiː-/ *noun*

کەلەبردار؟، تیولدار ◌ تیول‌دار

**feoffecment** /'fiːfm(ə)nt, US 'fef-/ *noun*

بەخشین یان راگوێستنی کەلەبر یان تیول ◌ واگذاری تیول

**feoffor** /'fefə/ *noun*

کەلەبربەخش، کەلەبر(پێ)دەر، تیولبەخش ◌ تیول‌بخش

**feracious** /fe'reɪʃəs/ *adjective*

زەنوێر، مایەدار، بەبڕشت، بەبەرهەم، بەپیت ◌ حاصل‌خیز، بارور

**feracity** = fertility

**feral** /'ferəl/ *adjective*

کێوی، لاوڕ، نەرام، نادەستەمۆ، هۆڤی، دڕ، هار، بۆهاتوو، یانیگر، پەلامارده‌ر: *feral* ◊ *feral cats*؛ *feral teeth* ◊ *instincts* شێوەی ئاژەڵێکی کێوی دەدا؛ *a feral snarl* (خوازە) درندە: *He looked at me with a feral grin (= like a wild animal)* (بنەرەت: لە *fera* لاتینی "ئاژەڵ یان گیانەوەری کێوی، لاوڕ + -al") ◌ وحشی، غیراهلی

**fer de lance** /,feː də 'lɑːns/ *noun, pl.* fers de lance pronunc. same or fer de lances

جۆرێ ماری بەرگیری زل و پرمەترسی ئەمریکای باشووری و ناوەندی [ Bothrops atrox و جۆرە پێوەندیدارەکان] ◌ نوعی مار

**ferial** /'fɪərɪəl, US 'fe-/ *adjective*

ناماژە بە یەکێ لە رۆژەکانی حەوتووی کلێسەی کاتۆلیک (بێجگە لە رۆژی پشوو) ◌ یک از روزهای هفته (به غیر از روز تعطیل)

**ferine** /fɪraɪn/ = feral

**feringhee** /fə'rɪŋgi/ *noun*, also feringhi

(کۆن) کەسێ لە ڕەچەڵەکی هێند و پورتوگالی 3 (زۆرتر سووکانە، لە هێند و چەند بەشێکی رۆژهەڵاتی نیوەڕاست و دوور) فەرەنگی، ب.ت. سپی‌پێستێ ◌ 1 فرنگی 2 شخصی از تبار هند و پرتغالی

**ferity** /'ferətɪ/ *noun, pl.* ferities

کێویتی، هۆڤیبوون، لاوڕی، درندەیی، دڕی،

بۆهاتوویی، یانیگری، پەلامارده‌ری ◌ وحشیت

**fermata** /fɜːˈmɑːtə, US fɜːrˈm-/ = pause

**ferment** /ˈfɜːment, US ˈfɜːrm-/ *noun*

1 هەوین، ترشێنە، هەویرترش 2 ترشان 3 ئاژاوە، شڵەقان، نائارامی، ئاڵۆزی، گەرەلاوژە، شێواوی، ورووژان، جۆش‌وخرۆش: *a period of intense political ferment* (بنەرەت: لە *ferment* (ناو)، *fermenter* (کار) فەرەنسەی کۆن، لەسەر بنچینەی *fermentum* لاتین "yeast"، لە *fervere* "کولاندن") ◌ 1 مخمر 2 تخمر 2 آشوب، هیجان، ناآرامی

**fermentable** /fɜˈmentəbl/ *adjective*

لەترشان‌هاتوو، بترش ◌ تخمیرپذیر

**fermentation** /ˌfɜːmenˈteɪʃn, US ˌfɜːrm-/ *noun*

1 ترشاندن، ترشان، هەڵهاتن 2 ئاژاوە، شڵەقان، نائارامی، ئاڵۆزی، گەرەلاوژە، شێواوی، قەیران، پشێوی ◌ 1 تخمیر 2 آشوب، ناآرامی

**fermentative** /ˈfɜːmenteɪtɪv, US ˈfɜːrm-/ *adjective*

ترشێنە(ر)، شیاوی ترشان، لەترشان‌هاتوو ◌ مخمر، قابل تخمیر

**fermented** *adjective*

ترشاو، ترشێنراو ◌ تخمیرشده

**fermentive** /fəˈmentɪv/ *adjective*

ترشێنە، دەبێتە مایەی ترشان: *fermentative organisms* ◌ مخمر

**fermion** /ˈfəːmɪɒn/ *noun*

(فیزیک یان کیمیا) فێرمیون: پارچۆلکەیێکی ژێرگەردیلەیی subatomic particle (وەک ئێلیکترۆن، پرۆتۆن یان نۆترۆن، fermionic *adj* بنەرەت: لە ناوی فیزیکزانی ئیتالیایی Enrico *Fermi* + on-) ◌ فرمیون

**fermium** /ˈfɜːmiəm, US ˈfɜːrm-/ *noun*

(فیزیک) فێرمیۆم (بە ژ.گ. 100، ن. Fm) ◌ فرمیوم

**fern** /fɜːn, US fɜːrn/ *noun, pl.* same or ferns

گیاباوەشێن؟، سەفرابەر؟، نێرووک؟، سەرەخس، فێرن [پۆل Filicopsida] (بنەرەت ئەڵمانی رۆژاوا) ◌ سَرخَس، سَرَخس، جماز

**fernery** /ˈfɜːnərɪ/ *noun, pl.* ferneries

نێرووکەلان، سەرەخسەلان، سەرەخسان، سەرەخسەجار ◌ سرخس‌زار

**fern seed** *noun*

دەنکی نێرووک، بەرەنێرووک، دەنکی سەرەخس ◌ دانەی سرخس

**ferocious** /fəˈrəUSəs, US -ˈroU-/ *adjective*

1 کێوی، در، هۆڤ، درندە، بۆهاتوو، پەلامارده‌ر، تێ‌رۆهاتوو، درندانە، بێ‌بەزەییانە: *a ferocious predator* 2 توندوتیژ، توند، سەخت: *ferocious opposition to the plan* 3 ◊ *heat* پرمەترسی، ترسناک، بەترس ◌ 1 وحشی، سبع، وحشیانە 2 شدید 3 خطرناک

**ferociously** /fəˈrəUSəsli, US -ˈroU-/ *adverb*

1 درندانە، درانە، پەلامارده‌رانە 2 بە توندی ◌ 1 وحشیانە 2 بە شدت

**ferociousness** /fəˈrəUSəsnəs, US -ˈroU-/ *noun*

1 درندەیێتی، درێتی، هۆڤێتی 2 توندوتیژی، توندی ◌ 1 وحشی‌گری 2 خشونت، شدت

**ferocity** /fəˈrɒsəti, US fəˈrɑːs-/ *noun, pl.* ferocities

1 درندەیی، هۆڤێتی، درێتی، درندەگەری، بێ‌بەزەیێتی، زەبروزەنگ، توندوتیژی 2 کردەوەی توندوتیژانە، کردەوەی درندانە 3 (ferocities /fəˈrɒsətiesˌ fəˈrɑːs-/) کارەساتەکان ◌ 1 سبعیت، وحشی‌گری خشونت 2 اقدام وحشیانە 3 (درجمع) فجایع

**-ferous** (also usu. -iferous) *suffix*

پاشگر: خاوەن، ـدار، تیابوو، ـزێ، ـهێن(ەر)، بەرهەم‌هێنەر: *Carboniferous* (بنەرەت: لە *fère* فەرەنسی یان *-fer* لاتین "producing") ◌ پسوند: دارندە، ـآور، ـزا، تولیدکنندە

**ferrate** /ˈfɛreɪt/ *noun*

(کیمیا) خوێیێ کە لەودا anion هەم ئاسن و هەم ئۆکسیژێنی تیایە: *sodium ferrate* ◌ نمک جوهر آهن

**ferredoxin** *noun*

کۆمەڵێ لە پرۆتێنە کە ئاسن و سۆلفۆریان تیایە و وەک هەڵگرێکی ئێلیکترۆن بە درێژایی رۆشنەپێکهاتن کار دەکەن (یا لە رۆشنەپێکهاتن‌دا کاری راگوێستنی ئێلیکترۆن دەکەن)، کۆمەڵێ لە پرۆتێنە سوور-قاوەییەکانی نێو گیا سەوزەکان، قەوزە شین-سەوزەکان و هێندێ لە بەکتریاکان ◌ فردوکسین

**ferrel** /ˈfɛr(ə)l/ = ferrule

**ferret** /ˈferɪt/ *noun*

1 مشکەخۆرە، خورماپێچان، مشکەخورما [*Mustela furo*] 2 گەرانی شێلگیرانە، کەڵ‌وکون‌کردن ◌ 1 راسو 2 جستجوی جدی

**ferri-** /ˈferi/ *prefix*

پێشگر: ئاسن، ئاسنێ کە هاوهێزییەکەی valency سێ بێ، ferric (بنەرەت: لە *ferrum* لاتینەوە "iron"، بڕوانە -ferro) ◌ پیشوند: آهن

**ferriage** /ˈfɛrɪdʒ/ *noun*

راگوێستن یا هەڵگرتن بە ferry ◌ حمل با کلک

**ferric** /ferɪk/ *adjective*

ئاسنی، ئاسنین، ئاسن‌دار، ئاسن‌تیابوو، سەربە ئاسنێ کە هاوهێزییەکەی سێ بێ، سەربە ئاسنی (III) ◌ آهنی، آهن‌دار

**ferric ammonium citrate** *noun*
ئاسنی، ئاسنین، ئاسن‌دار، ئاسن‌تیابوو ۞ سیترات آمونیوم آهن‌دار

**ferric chloride** *noun*
کلۆرایدی ئاسن‌دار: ئاوێتەیێکی ڕەق $FeCl_3$، بۆ هەڵکۆلین و لە بواری پزشکی‌دا وەک astringent و styptic بە کاردێتریێ ۞ کلورید آهن‌دار

**ferric oxide** *noun*
ئۆکسایدی ئاسن‌دار: ئاوێتەیێکی کریستالی سوور $Fe_2O_3$، لە سروشت‌دا وەک hematite و ژەنگ دۆزراوەتەوە (و هەروەها بە شێوەی دەسکرد بەرهەم دێنرێ)، وەک ڕەنگ، ماکە مەگناتیکەکان و mordant بەکاردێتریێ ۞ اکسید آهن‌دار

**ferricyanic acid** *noun*
ترشەلۆکی فێرریسیانیک $H_3Fe(CN)_6$: بەهۆی کارلێککردنی فێرریسیانید(ێ) و ترشەلۆکێ بەرهەم دێتریێ ۞ اسید فرریسیانیک

**ferricyanide** *noun*
فێرریسیانید: 1 ئانیۆنی سێ‌هاوهێز $2\ Fe(CN)_6^{3-}$ ئاوێتەیێ کە ئانیۆنی فێرریسیانیدی تیایە؛ ب.ت. خوێی سوور $K_3Fe(CN)_6$ کە بۆ دروست‌کردنی ڕەنگە شینەکان بەکاردێتریێ ۞ فرریسیانید

**ferriferous** /fe'rɪfərəs/ *adjective*
ئاسن بەرهەم دێنێ، ئاسن‌هێنەر، ئاسن‌گر، ئاسن‌دار، ئاسناوی، خاوەن‌ئاسن، ماکی ئاسنی تیایە ۞ تولیدکنندەی آهن، آهن‌دار

**ferrimagnetic** *adjective*
ئاماژە بە شێوەیێکی لاوازی ferromagnetism (ferrimagnet *n*؛ ferrimagnetically *adv*؛ ferrimagnetism *n*) ۞ فری‌ماگنتیک

**Ferris wheel** /'ferɪs wi:l/ *noun*
سارسارۆک، چەرخ‌وفەلەک (بنەڕەت: لە ناوی George W. G. *Ferris*، داهێنەری ئەمریکایی ئەو دەزگایە) ۞ چرخ و فلک

**ferrite** /'fɛrʌɪt/ *noun*
1 ئاوێتەیێکی مەگناتیکی ئۆکسایدی ئاسن‌دار لەگەڵ ئۆکسایدی کانزایی تر، لە ناوکەکانی یادگەی کامپیوتێر و دەزگاکانی تری ئێلیکترۆنی‌دا بەکاردێتریێ 2 (کانزاناسی) شێوەیێکی ئاسنی پۆخت کە لە کانزا ئاسن‌دارەکان پێکهاتووە ۞ فرریت

**ferritic** /fɛ'rɪtɪk/ *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە فێرریتەوە هەیە ۞ وابسته به فرریت

**ferritin** *noun*
پرۆتئینێکی جەرگ، سپڵ و مۆخی ئێسک کە ئاسن بۆ بەکارهێنانی میتابۆلیزم هەڵدەگرێ (یان پاشەکەوت دەکا)؛ جۆرێ پرۆتئینی ئاسن‌داری کریستالی کە کارەکەی هەڵگرتن یان پاشەکەوت‌کردنی ئاسنە و ب.ت. لە جەرگ و سپڵ‌دا دۆزراوەتەوە ۞ فرریتین

**ferro-** /'fɛrəʊ/ *prefix*
پێشگر: 1 ئاسنی تیایە 2 *ferroconcrete* (کیمیا) ئاسنێ کە هاوهێزی‌یەکەی valency دوو بێ، ferrous (بنەڕەت: لە *ferrum* لاتین "iron"، بڕوانە -ferri) ۞ پیشوند: 1 دارای آهن 2 آهنی با ظرفیت سه

**ferroalloy** *noun*
دارشتەی ئاسن(اوی) ۞ آلیاژ آهن(دار)

**ferroconcrete** /ˌferəʊ'kɒŋkrit/ *noun*
کۆنکرێتی شیش‌بەند یان میل‌بەند ۞ بتون آرمه

**ferrocyanic acid** *noun*
ترشەلۆکی فێرۆسیانیک $H_4Fe(CN)_6$: بەهۆی کارلێککردنی فێرۆسیانید(ێ) و ترشەلۆکێ بەرهەم دێتریێ ۞ اسید فرروسیانیک

**ferrocyanide** *noun*
1 ئانیۆنی چوارهاوهێز $Fe(CN)_6^{4-}$ 2 ئاوێتەیێ کە ئانیۆنی فێرۆسیانیدی تیایە؛ ب.ت. خوێی $K_4Fe(CN)_6$، بۆ سازکردنی ڕەنگە شینەکان (وەک Prussian blue) بەکاردێتریێ ۞ فروسیانید

**ferroelectric** *adjective, noun*
*adj* فێرۆئێلیکتریک: ماکێکی کریستالی کە تایبەتمەندی جەمسەر(گر)ی ئێلیکتریسیتەی هەیە *n* ماکێکی فێرۆئێلیکتریک ۞ (مادەی) فروالکتریک

**ferroelectricity** *noun*
فێرۆئێلیکتریسیتە ۞ فروالکتریسیته

**ferromagnesian** *adjective*
(لەمەڕ کانی و تەختەبەردەکانەوە) ئاسن و مەنیزیۆمیان تیایە: *ferromagnesian minerals* ۞ محتوی آهن و منیزیوم

**ferromagnet** *noun*
فێرۆمەگنات، فێرۆمەگنەت: ماکێکی فێرۆمەگناتیک ۞ فرومغناط

**ferromagnetic** /ˌferəʊmæg'netɪk, US ˌferoʊ-/ *adjective*
فێرۆمەگناتیک، فێرۆمەگنەتیک (ferromagnet *n*) ۞ فرومغناطیسی

**ferromagnetism** *noun*
فێرۆمەگناتیزم، فێرۆمەگنەتیزم ۞ فرومغناطیس

**ferrosilicon** *noun*
ئاسن‌سیلیکۆن، فێرۆسیلیکۆن: دارشتەیێکی ئاسن و سیلیکۆن کە ڕێژەی سیلیکۆنەکەی لە 15 وە تا 95 ـە ۞ فروسیلیکون

**ferrotype** *noun*, also tintype
فێرۆتایپ: 1 وێنەیێکی سەر تەلش یان وەرەقە تەنەکە یان ئاسنی میناکراو، وێنەگری لەسەر وەرەقە ئاسکەکانی ئاسن یان تەنەکە 2 ئەو شێوازە، پرۆسەیێ کە وێنەیێکی وا هەڵدەگیرێتەوە ۞ فروتیپ

**ferrous** /'ferəs/ *adjective*
1 ئاسنی، ئاسن‌دار، ئاسناوی، ئاسنی تیایە، ئاسن تیابوو 2 (کیمیا) سەربە ئاسنی بە هاوهێزی دوو ◌ 1 آهن‌دار، وابسته به آهن 2 فروس
**ferrous oxide** *noun*
ژەنگ یان ئۆکسایدی ئاسن: گەردێکی رەش FeO لە ئاودا ناتوێتەوە و لە ترشەلۆکدا دەتوێتەوە. بۆ دروستکردنی شووشە و پۆلا بەکاردێتری ◌ زنگ یا اکسید آهن
**ferrous sulphate** *noun*, also ferrous sulfate or copperas
سولفاتی ئاسن $FeSO_4.7H_2O$، بۆ بەرهەمهێنانی رەنگەکان، جەوهەرەکان و خوێیەکانی تری ئاسن و لە پزشکیدا بۆ چارەسەری کەمخوێنی (کە بەهۆی کەمی ئاسن تووش بووە) بەکاردێتری ◌ سولفات آهن
**ferruginous** /fɛ'ru:dʒɪnəs/ *adjective*
1 ئاسنی، ئاسناوی، خاوەن‌ئاسن، ئاسن‌دار، ئاسنی تیایە 2 ژەنگی، بە رەنگی ژەنگی ئاسن ◌ 1 آهن‌دار 2 زنگاری
**ferrule** /'feru:l, US 'ferəl/ *noun*, also ferrel
کلاوە، ئالقە، بن‌پۆش، بن (هی گۆچان)، بنگر، بنگیر، کلکە، بن، کنگەپۆش (چەتر؛ ferruled *(adj)* ◌ طوقه، حلقه
**ferry** /'feri/ *noun, pl.* ferries, also ferryboat
1 کەلەک، کەشتی، گەمی، کەلەس (بۆ پەڕاندنەوەی کەل‌وپەل و خەڵک لەم‌بەر بۆ ئەوبەری چۆم یان رووبار) 2 وێستگەی کەلەک یان فێری 3 جێی پەڕینەوەی ئاوی ◌ 1 فری 2 ایستگاه فری 3 گذرگاه آبی
**ferryman** /'ferimən/ *noun, pl.* ferrymen
کەلەکبەر، کەلەکەوان، فێرییەر ◌ فریمن
**fertile** /'fɜ:taɪl, US 'fɜ:rtl/ *adjective*
1 بەبرشت، بەپیت، برشت‌دار، بەبەرهەم، بەبر، بەبەر، مایەدار، بەمایە، خورت، زۆربر، زەنوێر، بەرەکەت‌دار، ئادان 2 پیتێنراو (تۆو)، چاککراو 3 داهێنەر 4 شینبوو، رووەک، رووەندە، سەوزبوو 5 بەزەو، زایا، بزێ ◌ 1 بارور، حاصلخیز 2 بارورشده 3 خلاق 4 رویندە 5 زاینده
**fertile crescent** *noun*, also Fertile Crescent
کەوانەی بەبرشت، لابازنەی بەپیت (ناوچەیێکی کشت‌وکاڵی کەوانەیی رۆژهەڵاتی نزیکی Near East کۆن کە لە دەریای مەدیتەرانەوە دەس پێ‌دەکا و لە نێوان رووبارەکانی دیجلە Tigris و فورات Euphrates تا کەنداوی فارسی درێژ دەبێتەوە) ◌ هلال خصیب
**fertility** /fə'tɪləti, US fər't-/ *noun*
1 بەبرشتی، برشت، بەبەری، بەبەرهەمی، بەپیتی، مایەداری، ئیروو، زۆربری، خورتی، زەنوێری، ئادانی 2 داهێنەری، داهێنەریتی، داهێنان 3 بەزەوی، زایا ◌ 1 باروری، حاصلخیزی 2 خلاقیت 3 زایندگی
**fertility drug** *noun*
دەرمانی پیتێنەر (بۆ زگپڕکردنی ژنان)، دەرمانی سکپڕی ◌ داروی حاملگی
**fertility restoration** *noun*
گێڕانەوەی بەبرشتی، گەڕاندنەوە یان بووژاندنەوەی بەبەرهەمی یان بەپیتی، گێڕانەوەی مایەداری ◌ اعادەی باروری
**fertility restoring genes** *noun. pl.*
نژادە یان ژێنە بەبرشتی‌گێڕەوەکان، نژادەکانی بەبەرهەمی یان بەپیتی‌گێرەوە، ژێنەکانی مایەداربووژێن ◌ ژن‌های بازگرداننده‌ی باروری
**fertilizable** /'fɜ:təlaɪzəbl/ *adjective*
شیاوی پیتاندن، لەپیتاندن‌هاتوو، دەپیتێنرێ ◌ قابل بارورسازی
**fertilization** /ˌfɜ:təlaɪ'zeɪʃn, US ˌfɜ:rtələ'z-/ *noun*
پیتاندن، مایەدارکردن، چاککردن، پیتێنەپێوەکردن، کودپێوەکردن، پەیینادن، پەیین‌تێکردن ◌ بارورسازی، القاح، کوددهی
**fertilization membrane** *noun*
پەردەی پیتاندن ◌ غشاء باروری
**fertilization tube** *noun*
لوولەی پیتاندن، لوولەی جووت‌بوون ◌ لولەی باروری
**fertilized** *adjective*
پیتێنراو، چاککراو ◌ بارورشده
**fertilizer** /'fɜ:təlaɪzə(r), US 'fɜ:rt-/ *noun*
پەیین، گوێرە، پەیینک، پیتێنە (chemical و natural) ◌ کود
**ferula** /'feru:l, US 'ferəl/ *noun*, also ferula. *pl.* Ferulae
(رووەکناسی) لە تیرەی fennel giant ◌ فرولا
**ferule** /'fɛru:l/ *noun*, also ferula
1 تەختە یان راستەیێکی پان بۆ بێزارکردنی منداڵ، دار(دەس) 2 گۆچان، گورز، گۆپاڵ (بنەڕەت: لە ferula لاتین "رەزیانەی زلە") ◌ 1 چوب 2 عصا، گرز
**fervency** /'fɜ:vənsɪ, US 'fɜ:rv-/ *noun*
1 بەپەرۆشی، تامەزرۆیی، بەتینی، بەتاوی، لەجۆش‌بوون، بەگوڕبوون، تین‌وتاو، تاووتین، گەرم‌وگوڕی 2 توندوتیژی، توندی، بەهێزی ◌ 1 اشتیاق، حرارت 2 شدت
**fervent** /'fɜ:vənt, US 'fɜ:rv-/ *adjective*, also -vid /'fɜ:vɪd, US 'fɜ:rvɪd/
1 بەپەرۆش، بەتین، بەتاو، گەرم‌وگوڕ، لەشەوق، لەجۆش، بەگوڕ، تامەزرۆ، گەرم‌وگوڕانە: a fervent admirer/believer/supporter ◊ a 2 توندوتیژ، توند، بەهێز، سەخت: a fervent belief/hope/desire ◌ 1 مشتاق، پرحرارت، صمیمانە 2 شدید، سخت

**fervently** /ˈfɜːvəntli, US ˈfɜːrv-/ *adverb*
1 تامەزرۆیانە 2 بە توندی ◌ 1 مشتاقانە 2 بە شدت

**fervour** /ˈfɜːvə(r), US ˈfɜːrv-/ *noun*, US fervor
تین، گەرموگوڕی، کەفوکوڵ، تاوتین، شەوق، بەپەرۆشی، تامەزرۆیی، enthusiasm: *religious/patriotic -ur* ◌ اشتیاق، تب و تاب

**fescue** /ˈfɛskjuː/ *noun*
1 گیایێکی گەلاباریک، چەند جۆرێکی بۆ لەوەڕ و تفاق بەنرخن [توخمەکانی *Festuca* و *Vulpia*] 2 شووڵ، تووڵ (کە مامۆستا بەو شتێ بە شاگرد نیشان دەدا) 3 دەنووکە ◌ 1 علف بره 2 چوب 3 مضراب

**fess** /fɛs/ *noun*, also fesse
1 (Heraldry) میلەیێکی پۆیی ئاسۆیی پان کە بە نیوەڕاستی قەڵغانێکدا تێدەپەڕێ 2 خاڵی نیوەڕاستی زرێ و قەڵغان و مەتاڵ یان چەکوچۆڵەوە ◌ فس

**fess point** *noun*
(heraldry) خاڵی نیوەڕاستی مەتاڵێ ◌ نقطەی میانی سپر

**-fest** *suffix*
پاشگر: 1 ئاهەنگ، سووران 2 کۆبوونەوە یان دانیشتنی بەرفراوان (بنەڕەت: لە *Fest* ئەڵمانی "festival") ◌ پسوند: 1 جشن 2 همایش بزرگ

**festa** /ˈfɛstə/ *noun*
جەژنی دینی یا هی تر (بنەڕەت: لە ئیتالیاییەوە بە واتای "festival") ◌ عید مذهبی یا دیگری

**festal** /festl/ *adjective*
جەژنی، سەربە ئاهەنگ، سەربە سووران، festive (festally *adv*) ◌ وابسته به جشن

**festering** *adjective*
کێماوی، چڵک کردوو، ئاودزاوی، ئاودزکردوو ◌ عفونی

**festival** /ˈfestɪvl/ *noun, adjective*
*n* 1 جەژن، جێژن، سووران، ئاهەنگ 2 فێستیڤاڵ *adj* سەربە سووران، سەربە جێژن، (جەژنان festival-season) ◌ *n* 1 عید، جشن 2 جشنواره *adj* وابسته به جشن یا عید

**festival of lights** = 1 Hannukah 2 Diwali

**Festival of the Dead** = Bon

**festive** /ˈfestɪv/ *adjective*
1 جێژنی، سەربە جێژن 2 سەربە ئاهەنگ یا سووران 3 شاد، خۆش، دڵشاد ◌ 1 وابسته به عید 2 وابسته به جشن 3 شاد

**festivity** /feˈstɪvəti/ *noun, pl.* festivities
1 سووران، سوور، ئاهەنگ، بەزموڕەزم، شایی، تۆی 2 (festivities) سووران، ئاهەنگ ◌ 1 جشن، جشن و سرور 2 (در جمع) جشن

**festively** /ˈfestɪvli/ *adverb*
بە خۆشی و شادی ◌ با سرور

**festoon** /feˈstuːn/ *noun*
زنجیرەگوڵ، گوڵبەست، چەلە، گوڵبەند، تاجەگوڵینە ◌ رشته، حلقەی گل

**Festschrift** /ˈfestʃrɪft/ *noun, pl.* Festschriften or Festschrifts
(ئەڵمانی) فێستشریفت (کۆمەڵێ لە بابەتە بڵاوبووەکانی توێژەرێ) ◌ فستشریفت

**feta cheese** /ˌfetə ˈtʃiːz/ *noun*, also fetta
پەنیری سپی یۆنانی، پەنیری فێتا (لە شیری مەڕ و بزن) ◌ پنیر فتا

**fetal** /ˈfiːt(ə)l/ *adjective*
سەربە ئاولەمە، ئاوەڵەمەیی، کۆرپەلەیی، ئاولەمەیی، ئاولەمەیی ◌ جنینی

**fetation** *noun*
سکپڕی، دووگیانی، پێکهاتن یا گۆڕانی ئاوەڵەمە لە مناڵدانا ◌ آبستنی

**fetch** /fetʃ/ *noun*
1 چوون و هێنان، هێنانەوە 2 (کەشتیگیری) لادان، لاگۆڕین 3 فێڵ، تەڵەکە، کەڵەک 4 هەوڵ، تێکۆشان، بزاف ◌ 1 رفتن و آوردن 2 تغییر مسیر 3 حیله 4 کوشش

**fetching** /ˈfetʃɪŋ/ *adjective*
خوێنشیرین، سەرنجڕاکێش، دڵڕفێن: *a -ing little garment* ◌ جذاب

**fetchingly** /ˈfetʃɪŋli/ *adverb*
دڵرفێنانە، بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش: *Strands of hair hung fetchingly around her face* ◌ به طور جذاب

**fête** /feɪt/ *noun*
سوور، ئاهەنگ، سووران ◌ جشن

**fête-day** *noun*
جەژن ◌ عید

**feti-** *prefix*
پێشگر: ئاوەڵەمە، کۆرپەلە، ئاولەمە، ئاولەمە: *feticide* ◌ پیشوند: جنین

**feticide** /ˈfiːtɪsaɪd/ *noun*
ئاوەڵەمەکوژی، کۆرپەلەکوژی، ئاولەمەکوژی ◌ جنین‌کشی

**fetid** /ˈfetɪd/ *adjective*, also foetid
بۆگەن، گەن، سفتۆ، هەڕنەمووتاوی، stinking: *fetid air* ◌ بدبو، متعفن

**fetidly** /ˈfetɪdli/ *adverb*
بۆگەنانە، بە شێوەیێکی بۆگەن ◌ به طور متعفن

**fetidness** /ˈfetɪdnəs/ *noun*
بۆگەنی، گەنی، سفتۆیی، بۆپیسی، هەڕنەمووت ◌ تعفن

**fetish** /ˈfetɪʃ/ *noun*
1 بت، تەلەسم 2 جادوو ◌ 1 بت، طلسم 2 جادو

**fetishism** /ˈfetɪʃɪzəm/ *noun*
بتپەرستی، بتگەری ◌ بت‌پرستی

**fetishist** /'fetɪʃɪst/ *noun*
بت‌پەرست، بت‌گەر ۞ بت‌پرست

**fetishistic** /ˌfetɪ'ʃɪstɪk/ *adjective*
بت‌پەرستی‌یانە، سەربە بت‌پەرستی ۞ وابستە بە بت‌پرستی

**fetlock** /'fetlɒk, US -lɑ:k/ *noun*
1 قولاپەی پێ، قولەپێ 2 تووک یان مووی قولەپێ (ئەسپ) ۞ 1 مچ پا 2 موی مچ پا

**feto-** = feti-

**fetor** /'fi:tə/ *noun*
بۆگەنی، stench ۞ تعفن

**fetoscope** *noun*
ئاوەڵمەبین، کۆرپەلەبین، ئاوڵەمەبین (fetoscopy *n*) ۞ جنین‌نما

**fetta** = feta

**fetterless** *adjective*
بێ‌کۆت‌وبەند، ئازاد، بێ‌بەند، نەبەسراو، رەها، بەرەڵا، وێڵ ۞ بی‌قید

**fetterlock** /'fetəlɒk/ *noun*
1 قولاپەی پێ، قولەپێ 2 تووک یان مووی قولەپێ (ئەسپ)، مووی پشت‌پاژنە 3 پێوەند، پاوەن ۞ 1 مچ پا 2 موی مچ پا 3 بخو

**fetters** *noun, pl.*
1 کوت‌وزنجیر، پێوەند، کۆت‌وبەند، ئەشکێل 2 بەرتەنگی، بەرتەسکی، کۆسپ، تەگەرە ۞ 1 غل و زنجیر، قید و بند 2 محدودیت، مانع

**fettle** /'fetl/ *noun*, in fine fettle
لە رەوشێکی باش‌دا، دەق، لەبار، لە وەزعێکی باش‌دا، باش‌بارکەوتوو، بارباش، سلامەت، ساغ، ساخلەم، تەندورست ۞ در وضعیت خوب، سالم

**fettler** /'fetlə(r)/ *noun*
کرێکاری پاراستنی رێی ئاسن ۞ کارگر نگهداری راه آهن

**fettling** *noun*
زیخ یان شتی وا کە دەیکەنە بنی کوورەوە ۞ فتلینگ

**fetus** /'fi:təs/ *noun*, (Brit. (in non-technical use) also foetus), *pl.* fetuses
ئاوەڵمە، کۆرپەلە، ئاولەمە، پێز، پێزە، پز، تۆل ۞ جنین، رویان

**feud**[1] /fju:d/ *noun*
دوژمنایەتی، ململانێ، جورە، کێشە، خوونداری، قرە، قینەبەرایەتی ۞ دعوا، نزاع، خصومت

**feud**[2] /fju:d/ *noun*
کەلەبر، تیول، فیود ۞ تیول

**feudal** /'fju:dl/ *adjective*
فیودال، سەربە فیودالیزم یان دەرەبەگایەتی، خان‌خانی، دەرەبەگایەتی: *the feudal system* ◊ *feudal law* ۞ فئودال، ملوک‌الطوایفی، وابستە بە فئودالیسم، زمین‌داری

**feudalism** /'fju:dəlɪzəm/ *noun*
فیودالیزم، دەرەبەگایەتی، سیستەم یان رێکخستەی فیودالی، خان‌خانی ( **feudalist** /'fju:dəlɪst/ *n*: فیودال، دەرەبەگ؛ **feudalistic** /ˌfju:də'lɪstɪk/ *adj*: دەرەبەگایەتی‌یانە، سەرەبە دەرەبەگایەتی) ۞ فئودالیسم، زمین‌داری

**feudality** /fju:'dælɪtɪ/ *noun, pl.* feudalities
دەرەبەگایەتی، خان‌خانی، رێکخستە یان سیستەمی فیودالی ۞ نظام فئودالی

**feudalization** /-'zeɪʃ(ə)n/ *noun*, also feudalisation
کەلەبراندن، فیودالاندن، کردنە تیول، گۆڕین بۆ تیول ۞ تبدیل به تیول

**feudally** /'fju:dli/ *adverb*
بە شێوەیەکی فیودالی (یان دەرەبەگانە)، دەرەبەگانە ۞ به طور فئودالی

**feudatory** /'fju:dət(ə)ri/ *adjective, noun* (*pl.* feudatories)
*adj* فیودالی، دەرەبەگی *n* دەرەبەگ، فیودال ۞ *adj* فئودال *n* اقطاعی

**feudist** *noun*
1 بەشداری‌کەر لە دوژمنایەتی یان ململانێ‌دا، هاوپەیمان یان هاودەستی دوژمن 2 شارەزای ماف و قانوونی سەردەمی دەرەبەگایەتی ۞ 1 شرکت‌کننده در خصومت، متحد دشمن 2 فیودیست

**feuilleton** /'fɜ:rtɒ̃/ *noun*
گەلاچە: بەشێ لە رۆژنامە یان کۆڤار بۆ رەخنە، چیرۆک و... ۞ فیوایلتون

**fever** /'fi:və(r)/ *noun*
1 تێ، تاوتێ، تا، نۆبەتی 2 خرۆش، جۆش‌وخرۆش، تین‌وتاو، تاوتێ، تاووجۆش، وروژان، ئارام‌لێ‌هەڵگیراوی، هەژان، کلپەسەندن، شاگەشکەیی، هەڵچوون ۞ 1 تب 2 شور و هیجان، تب و تاب

**fever blister** *noun*, also cold sore
تامیسک، تێمیسک، زیپکەی لای لێو، خشروک، وەدایش ۞ تب‌خال

**fevered** /'fi:vəd, US -vərd/ *adjective*
1 تای هەیە، تێ‌دار، تێ‌گرتوو، تێ‌لێهاتوو: *She mopped his fevered brow* 2 وروژاو، شاگەشکە ۞ 1 تب‌دار 2 هیجان‌زده

**feverfew** /'fi:vəfju:/ *noun*
جۆرێ رووەکی بۆن‌خۆشی دەوەنی چکۆلە، تاپەرێن؟ [*Tanacetum parthenium*] (بنەرەت: لە *febrifuga* لاتین، لە *febris* "تا" + *fugare* "تاراندن") ۞ بابونه‌ی گاوی

**fever heat** *noun*
ئەوپەڕی وروژان، تەواو هەژین ۞ اوج هیجان

**feverish** /'fi:vərɪʃ/ *adjective*, also feverous
1 تادار، تێ‌دار، تێ‌لێهاتوو، تاگرتوو 2 وروژاو، شاگەشکە، ئارام‌لێهەڵگیراو، نائارام، بێ‌ئۆقرە، بێ‌حەجمان، بێ‌تاقەت، نگەران، دڵ‌لەدوا ۞ 1

تبدار 2 هیجانزده، مضطرب

**feverishly** /ˈfiːvərɪʃli/ *adverb*
ئارامنەهێڵگیراوانە، بە تاو، حەجمین‌نەبڕاوانە ◌ با بی‌تابی

**feverishness** /ˈfiːvərɪʃnəs/ *noun*
ورووژان، دڵەڕاوکێ، نگەرانی، ئارامنەهێڵگیراوی، نائارامی، تاوسەندویی، بێحەجمانی، حەجمین‌نەمان، بێئۆقرەیی، بێتاقەتی ◌ هیجان، اضطراب، بی‌تابی

**fever pitch** *noun*
ئەوپەڕی ورووژان، تەواو هەژین ◌ اوج هیجان

**fever tree** *noun*
1 دارەتا، داریکی ئەمریکای باکووری، بۆ دەرمانی مالاریا بە دریژایی شەوی نێوخۆ بەکاردێترا [*Pinckneya pubens*] 2 داریکی باشووری ئەفریکا، جاران پێیان وابوو مالاریای پێوەیە [*Acacia xanthophloea*] ◌ نوعی درخت

**feverweed** *noun*
(رووەکناسی) هەرپەک لە چەند جۆری رووەک لە خێزانی parsley، ب.ت. E. foetidum (هی دوورگەکانی هێندی رۆژاوا) یان E. campestre (هی ئەورووپا) [تۆخم *Eryngium*] ◌ نوعی گیاه

**feverwort** = 1 horse gentian 2 boneset

**few** /fjuː/ *adjective, pronoun, noun*
*adj, pron* کەمێ، بڕێ، نە زۆر، ژمارەیێکی کەم، هێندێ، چەند، ژمارەیێ، دەگمەن، کەم *n* (the few وەک کۆ) کەمینە، کێمانی ◌ *adj, pron* معدود، تعداد کمی، کم، نادر، قلیل *n* اقلیت

**fey** /feɪ/ *adjective*
1 نابەڕاست، شل، ناشێلگیر، نەرشت، سەیر، ناوازە، نائاسایی 2 شێت 3 بەدشوم، نەگریس، نەفرەتکراو (feyly *adv*؛ feyness *n*: سەیربوون، نائاسایێتی) ◌ 1 غیرجدی، شگفت، غیرعادی 2 دیوانه 3 مشئوم

**Feynman diagram** *noun*
(فیزیک) دیاگرامی فەینمەن (کارلێکە ئێلیکترۆمەگنەتیکەکانی نێوان پارچۆڵکەی ژێرگەردیلەیی پیشان دەدا؛ بنەڕەت: لە ناوی فیزیکزانی ئەمریکایی Richard P. Feynman (1918-1988) ◌ نمودار فینمن

**fez** /fez/ *noun, pl.* fezzes
فێز، فینە (کلاو؛ fezzed *adj*) ◌ فینه

**ff.** *abbreviation* following
و لاپەڕەکان یان دێڕەکانی تر ◌ اف‌اف (و صفحات یا سطور دیگر)

**ff** *abbreviation* fortissimo
زۆر تیژ، زۆر توند، زۆر بەرز (موسیقا، ئیتالیایی) ◌ بسیار بلند

**fiacre** /fɪˈɑːkrə, US -kə/ *noun, pl.* fiacres
(مێژوویی) جۆری کالیسکەی چوارپێچکەیی چکۆلە (بنەڕەت: لە ناوی Hôtel de St Fiacre لە پاریس، بۆ یەکەم جار ئەم کالیسکانە لەوێ کرێگێنشییان دەکرد) ◌ فیاکر

**fiancé** /fiˈɒnseɪ, -ˈɑːns-, US ˌfiːɑːnˈseɪ/ *noun*
دەزگیران، دەسگر (پیاو) ◌ نامزد

**fiancée** /fiˈɒnseɪ, US ˌfiːɑːnˈseɪ/ *noun*
دەزگیران، دەسگر، پاگیرە (ژن) ◌ نامزد

**fiasco**[1] /fiˈæskəʊ, US fiˈæskoʊ/ *noun, pl.* fiascos or fiascoes
تێشکانی تەواو، سەرنەگرتنی یەکجاری، ئاشبەتاڵ، نشوستی، مایەی ئابڕووچوون: *The party was a complete fiasco* ◌ شکست کامل، ناکامی

**fiasco**[2] /fiˈæskəʊ, US fiˈæskoʊ/ *noun, pl.* fiascos or fiascoes or or fiaschi
فیاسکۆ: جۆری شووشەی ملدرێژی کلۆش‌پێچ بۆ مەی ◌ فیاسکو

**fiat** /ˈfiːæt, US ˈfaɪæt/ *noun*
بڕیار، دەستوور، فەروار، فەرمان ◌ حکم، دستور

**fiat money** *noun*
پارەی بێپشتیوانە ◌ پول بدون پشتوانه

**fib** /fɪb/ *noun*
درۆی چکۆلە، قسە یان وتەی ناگرنگ و درۆ، قسەی قۆڕ، فشە، ترەهات، فڵتە ◌ دروغ کوچک، سخن دروغ و بی‌اهمیت

**fibber** *noun*
درۆزن، چاپوچووپباز، خۆهەڵکێش، فشەبلە، فشەچی، هارەوگیفەکەر ◌ دروغ‌گو، خالی‌بند

**fiber etc.** = fibre etc.

**Fibonacci series** /ˌfɪbəˈnɑːtʃi sɪəriːz, US sɪriːz/ *noun*, also Fibonacci number
(بیرکاری) فیبۆناتشی سیریز، زنجیرەیێ لەو ژمارانەی کە لەودا هەر ژمارەیێ لەگەڵ دوانەکەی پێشووی بەرامبەرە و بە *n* دەس‌پێدەکا، وەکوو: 1,1,2,3,5,8,13، و هتد (بنەڕەت: لە ناوی بیرکاری ئیتالیایی Leonardo Fibonacci دەوروبەری (1170-1250) ◌ فیبوناتشی سیریز

**fibr(o)-** *prefix*
پێشگر: ریشاڵ، تاڵ، شانەی ریشاڵی: *fibroid*؛ ریشاڵی و...: *fibrovascular* (بنەڕەت: لە لاتین *fibra* "fibre") ◌ پیشوند: لیف

**fibre** /ˈfaɪbə(r)/ *noun*. US fiber
1 ریشاڵ، تاڵ، چلە، چل، جاڵ، دەزوو، هەودا، تا، داو، فایبر، فیبر: ◊ *muscle fibres* 2 *cotton/wood/nerve fibres* پارچە 3 گیا ریشاڵییەکان، رووەکی ریشاڵی 4 چنراو، شانە، تانوپۆ، تەفن 5 کەسایەتی 6 سروشت ( -fibred *adj*) ◌ 1 تار، لیف، الیاف، نخ، رشته 2 پارچه 3 گیاهان سلولزدار 4 بافت 5 شخصیت 6 طبیعت

**fibreboard** /ˈfaɪbəbɔːd, US ˈfaɪbərbɔːrd/ *noun*, US fiberboard
تەختەریشاڵ، تەختەریشاڵینە ۞ فیبربورد

**fibreglass** /ˈfaɪbəglɑːs, US ˈfaɪbərglæs/ *noun*, US fiberbglass
ریشاڵەشووشە، شووشەریشاڵینە ۞ پشم شیشە

**fibreless** *adjective*
بێریشاڵ ۞ بدون الیاف

**fibre optic** *adjective*, US fiber optic, also fibre-optic
سەربە رووناکی‌ناسی ریشاڵی: *fibre-optic cables* ۞ وابستە بە فیبر نوری

**fibre optics** *noun*, US fiber optics
رووناکی‌ناسی ریشاڵی، ڕۆشنە ریشاڵ ۞ فیبر نوری

**fibriform** /ˈfaɪbrɪfɔːm/ *adjective*
شێوەریشاڵ، ریشاڵئاسا، تاڵئاسا ۞ لیفی‌شکل

**fibril** /ˈfʌɪbrɪl/ *noun*
ریشاڵۆچکە، ریشاڵچە، تاڵۆچکە (ب.ت. ڕەگی مووی رووەک، چکۆلینراوی *fibra* "ریشاڵ"؛ *fibrillary adj*) ۞ لیف کوچک

**fibriliform** /faɪˈbrɪfɔːm/ *adjective*
ریشاڵۆچکەیی، ریشاڵچەئاسا، تاڵۆچکەئاسا ۞ مانند لیف کوچک

**fibrillar** *adjective*
ریشاڵۆچکەیی، تاڵۆچکەیی ۞ وابستە بە لیف کوچک

**fibrillation** *noun*
ریشاڵاندن، ریشاڵریشاڵکردن، پێکهێنانی ریشاڵی، فیبریلاسیۆن، فایبریلەیشن؛ کرژبوونی ریشاڵە ماسوولکەییەکان بەبێ هاوکاری یەکتر؛ لەرینەوە و کرژی ناڕێکی زۆر خێرای ریشاڵە ماسوولکەکانی دڵ ۞ بافت‌سازی، تشکیل الیاف؛ فیبریلاسیون

**fibrin** /ˈfaɪbrɪn, US ˈfɪb-/ *noun*
(زیندەکیمیا) ریشاڵین، فایبرین، فیبرین (*fibrinous adj*) ۞ فیبرین

**fibrinogen** /faɪˈbrɪnədʒən, US fɪˈb-/ *noun*
ریشاڵپێکهێن ۞ فیبرینوژن

**fibrinoid** *adjective*
ریشاڵینی، ریشاڵین‌ئاسا ۞ فیبرینوید

**fibrinolysin** *noun*
هەریەک لەو چەندین هەوێنە proteolytic ـانەی کە شیبوونەوە یان هەڵوەشانەوەی پەنگینە خوێنییەکان دەبەنە سەرەوە ب.ت. پلازمین plasmin ۞ فیبرینولیسین

**fibrinolysis** /ˌfʌɪbrɪˈnɒlɪsɪs, ˌfɪb-/ *noun*, *pl*. fibrinolyses
شیبوونەوەی ریشاڵین (شیبوونەوەی هەوێنەیی ریشاڵین یان فیبرین لە پەنگین و جەڵغەی خوێنی‌دا؛ *fibrinolytic adj*) ۞ تجزیەی فیبرین

**fibro** /ˈfʌɪbrəʊ/ *noun*, *pl*. fibros
(ئەوسترالیا) ریشاڵتۆ (تێکەڵەیێکی ئازبێست و چیمەنتۆ، بە شێوەی تەبەقەیی دروست دەکرێن و بۆ خانوو بەکاردێترێ) ۞ فیبرو

**fibro-** = fibr-

**fibroadenoma** *noun*, *pl*. fibroadenomas or fibroadenomata
ڕزێنە یان لووی بێمەترسی benign کە لە شانەی لوویی‌یەوە glandular tissue پەیدا دەبێ (یان سەرهەڵدەدا) ۞ فیبروادنوما

**fibroblast** /ˈfʌɪbrə(ʊ)blast/ *noun*
خانەیێکی نێو شانەی پێوەستی connective tissue کە کۆلاژین و ریشاڵەکانی تر بەرهەم دێنێ (*fibroblastic adj*) ۞ فیبروبلاست

**fibrocartilage** *noun*
1 کرۆژە یان کرکراگەی ریشاڵی، کرۆژەی ریشاڵدار 2 بەش یان پێکهاتەیێ کە لە کرۆژەیێکی وا سازبووە (*fibrocartilaginous adj*) ۞ 1 غضروف رشتەای 2 فیبروکارتیلاج

**fibrocyte** *noun*
خانەی تەشی‌ئاسای بەستەرەشانە یا شانەی پێوەستی، خانەی بەستەرەشانە، ژوورەی ریشاڵی (*fibrocytic n*) ۞ فیبروسیت

**fibroid** /ˈfaɪbrɔɪd/ *adjective*, *noun*
*adj* 1 ریشاڵئاسا، شێوەریشاڵ، ریشاڵی 2 پێکهاتوو لە ریشاڵەکان *n* 1 = fibroma 2 = leiomyoma ۞ رشتەمانند، لیفی

**fibroin** /ˈfʌɪbrəʊɪn/ *noun*
پرۆتینێ کە پێکهێنەری سەرەکی هەوریشمە ۞ فیبروین

**fibroma** /faɪˈbrəʊmə, US -broʊ-/ *noun*, *pl*. fibromas or fibromata /-mətə/
ریشاڵئاوسان، ئاوسانی ریشاڵی (*fibromatous adj*) ۞ آماس لیفی

**fibromyalgia** = fibrositis

**fibroplasia** *noun*
پێکهاتنی شانەی ریشاڵی fibrous tissue تازە، وەک سارێژبوونەوەی برین (*fibroplastic adj*) ۞ فیبروپلاسیا

**fibrosis** /fʌɪˈbrəʊsɪs/ *noun*
ریشاڵان، (بە)ریشاڵبوون، زیادبوونی شانەی ریشاڵی (*fibrotic adj*: سەربە ریشاڵان یان (بە)ریشاڵبوون) ۞ فیبروز

**fibrositis** /ˌfʌɪbrəˈsʌɪtɪs/ *noun*
ریشاڵەسوێ، ریشاڵەئاوسان، ریشاڵەئاوسێن (*fibrositic adj*: سەربە ریشاڵەسوێ، سەربە ریشاڵەئاوسان) ۞ فیبروزیت

**fibrous** /ˈfaɪbrəs/ *adjective*
ریشاڵاوی، ریشاڵی، شێوەریشاڵ، ریشاڵئاسا: *a fibrous mineral*؛ *fibrous tissue*؛ tough؛ *fibrous texture*: sinewy (-sly /ˈfaɪbrəsli/

*adv*: بە شێوەیێکی ریشالاوی، ریشاڵئاسایانە؛ fibrousness *n*: ریشالاوی‌بوون، ریشالیتی، شێوەریشالی، ریشاڵئاسایی) ◌ لیفی، ریشه‌مانند

**fibrous membrance** *noun*
(کیمیا) پەردەی ریشالاوی، ریشالەپەردە ◌ غشای لیفی

**fibrous root** *noun*
ریشەی ریشالی، رەگی ریشالی (یان تاڵ‌تاڵ) ◌ ریشەی رشته‌ای

**fibrovascular bundle** = vascular bundle

**fibrovascular** *adjective*
خاوەنی پێکهاتەی ریشالی و خانە بەرێدابەرەکان ◌ فیبرو‌واسکیولار

**fibster** *noun*
درۆزن، فشەچی، چڵ‌چاخان ◌ دروغ‌گو، خالی‌بند

**fibula** /'fɪbjələ/ *noun, pl.* fibulae /-li:/ or fibulas
1 (توێکاری) ئێسکی تەلەزمە 2 (شوێنەوارناسی) گیرە، قولاپ (ی جوانی، لە لایەن یۆنانی و رۆمی‌یانی کۆنەوە؛ fibular /'fɪbjələ(r)/ *adj*: تەلەزمەیی، سەربە ئێسکی تەلەزمەیی، پێوەندی بە ئێسکی تەلەزمەوە هەیە) ◌ 1 استخوان نازک‌نی 2 قلاب

**-fic** (usu. as -ific) *suffix*
پاشگر: ـکار، ـگەر، ـساز، ـوان، هێنەر، کەر، یـی: *felicific*, *prolific* (-fically suffix): ئاوەڵکار ساز دەکا؛ بنەرەت: لە *-fique* فەرەنسی یان *-ficus* لاتین، لە *facere* "کردن، دروست کردن") ◌ پسوند: ساز، آور

**-fication** (usu. as -ification) *suffix*
پاشگر: (ئەو ناوانە لە کار ساز دەکا کە کۆتایی‌یان بە *-fy* هاتووە) ـکاری، ـکەری، ـگەری، ـسازی، وانی، هێنەری: (وەک *simplification* لە *simplify*؛ لە فەرەنسەوە یان *-fication-* لاتین (لەو کارانەی کە کۆتایی‌یان بە *-ficare* هاتووە) ◌ پسوند: آوری، سازی

**fiche** = microfiche

**fichu** /'fi:ʃu:/ *noun*
لەچکە یا کۆڵوانەی سێ‌گۆشە، ژنان بۆ سەر شان و ملیان ◌ فیچو

**fickle** /'fɪkl/ *adjective*
1 ناجێگیر، ناسەقامگیر، زووزووگۆڕاو، نابەردەوام، تاوتاو، بگۆڕ 2 رارا، وازی‌وازی، حوڵ‌حوڵی (fickleness *n*: 1 بگۆڕی، ناجێگیری، ناسەقامگیری، زووزووگۆڕاوی، تاوتاوی، ناچەسپیوی 2 رارایی، وازی‌وازی‌بوون، تاوتاوی، دەم‌دەمی، وازی‌وازێتی، دەم‌دەمی‌بوون؛ fickly *adv*: ناجێگیرانە، ناسەقامگیرانە، بگۆڕانە) ◌ 1 ناپایدار 2 دمدمی

**fictile** /'fɪktʌɪl, US -tɪl/ *adjective*
1 گڵینە، هەرگین 2 نەرم، مۆم‌ئاسا، دەق‌گیر ◌ 1 سفالی 2 شکل‌پذیر

**fiction** /'fɪkʃn/ *noun*
1 چیرۆک، داستان، چیرۆکی خەیاڵی، هەڵبەستەچیرۆک، رازە، چیرۆکەخەیاڵ 2 ئەندێشە، درۆ، قسەی بێ‌بنچینە، خەیاڵ 3 وێژەی خەیاڵی یان چیرۆکی 4 واخۆدەرخستن، واخۆنیشاندان، درۆ ◌ 1 داستان، قصه 2 پندار، وهم 3 ادبیات تخیلی یا داستانی 4 تظاهر

**fictional** /'fɪkʃənl/ *adjective*
1 خەیاڵی، ئەندێشەیی، چیرۆک‌ئاسا، ناراست(ەقینە)، داستانی، ئەفسانەیی: *fictional* *a fictional account of life on* ◊ *techniques a desert island* 2 (وا)خۆپیشاندەرانە، بەدرۆ (fictionally *adv*) ◌ 1 تخیلی، غیرواقعی، افسانه‌ای، وهمی، داستانی 2 متظاهرانه

**fictitious** /fɪk'tɪʃəs/ *adjective*
1 ناراست، ناراستەقینە، ئەندێشەیی، داهێنراو، هەڵبەستە، خەیاڵی، خەیاڵکرد، 2 imaginary واخۆپیشاندەرانە، درۆ، هەڵبەستە ( fictitiously *adv*: بە درۆ، خەیاڵکردانە، بە شێوەیەکی خەیاڵی؛ fictitiousness *n*: خەیاڵی بوون، درۆبوون) ◌ 1 تخیلی، غیرواقعی، موهوم 2 متظاهرانه

**fictive** /'fɪktɪv/ *adjective*
خەیاڵی، ئەندێشەیی، درۆ، هەڵبەستە، ناراست (fictively *adv*; fictiveness *n*: خەیاڵیتی، ئەندێشەییتی، هەڵبەستەبوون، ناراستی) ◌ موهوم

**ficus** /'fi:kəs, US 'fʌɪkəs/ *noun, pl.* same
هەنجیر، دەوەن یان داری هەنجیر، هەنجیرەکان و rubber plant دەگرێتەوە [توخم *Ficus*] ◌ انجیر، بوته یا درخت انجیر

**-fid** *suffix*
پاشگر: خاوەنی ژمارەیەکی دیاریکراو لە بەشەکاندا: *pinnatifid* ◌ پسوند: دارای عدد معین از اجزا

**fid** /fɪd/ *noun*
(دەریاوانی) 1 میلەی راگر(تن) 2 پواز، هۆرە ◌ 1 میله‌ی حایل 2 گوه

**fiddle** /'fɪdl/ *noun*
1 (نافەرمی) ڤیۆلۆن، کەمان 2 تەڵەکەبازی، فێڵ‌وتەڵەکە، فرت‌وفێڵ، گزەونی 3 کەمەی دەوری مێز (لەسەر کەشتی، تا شتەکان بەرنەبنەوە) ◌ 1 ویولن 2 حقه‌بازی 3 فیدل

**fiddle-back** *noun*
شێوەڤیۆلۆن، شێوەکەوان (پشتەوەی، وەک کورسی) ◌ شبیه ویولن

**fiddle-bow** /'fɪdlbəʊ/ *noun*
کەوان ◌ کمان

**fiddle-de-dee** *noun*
قسەی هیچەکە یان قۆڕ، فڵتە، یاوە، هەڵیت‌وپلیت ◌ چرند، یاوه

**fiddle-faddle** /'fɪdl fædl/ *noun*

قسەی هیچەکە یان قۆڕ، فلتە، هەلیتوپلیت ◌ چرند، مزخرف

**fiddle-head** *noun*

هەلـکۆڵراوی‌پێکـی تۆمارئاسـای لووتکـەی کەشتی، سەرکەوان ◌ فیدل‌هد

**fiddler** /'fɪdlə(r)/ *noun*

1 فیولـۆن‌ژەن، کـەوان‌ژەن 2 مـرۆی فێـڵەباز، دەسبڕ ◌ 1 ویولن‌نواز 2 آدم حقەباز

**fiddlestick** /'fɪdlstɪks/ *interjection*

قـەی قۆڕ! قسەی مفت! ترحێو! حەو! شیر! زیر! ◌ حرف مفت!

**fiddling** /'fɪdlɪŋ/ *adjective*

1 هیچەکە، ناگرنگ، قۆڕ، بێ‌بایەخ 2 بێ‌فایدە، بـێ‌کەڵـک، ئایـەخ ◌ 1 جزئـی، کـم‌ارزش 2 بی‌فایده، بی اهمیت

**fiddly** /'fɪdli/ *adjective* (fiddlier, fiddliest)

سـەخت، گـران، دژوار، پڕئـەرک، پڕزەحمـەت: *Zips are less -ly than buttons* ◌ پرزحمت

**fideism** /'fʌɪdɪɪz(ə)m/ *noun*

بڕواگـەری، بـڕواباوەری، ئیمـان‌بـاوەری ◌ ایمان‌گرایی

**fideist** /'fʌɪdɪɪst/ *noun*

بڕواگەر، بڕواباوەر، ئیمان‌باوەر ◌ ایمان‌گرا

**fideistic** *adjective*

سـەربە بـڕواباوەری، بڕواگـەر(ی)انـە، سـەربە ئیمان‌باوەری ◌ ایمان‌گرایانه

**Fidelista** *noun*

لایـەنگری کاسـترۆگەری Castroism ◌ پیـرو کاستروگرایی

**fidelity** /fɪ'deləti/ *noun, pl.* fideliteis

1 بەوەفایی، وەفاداری، سفەت، پێبەندی، پێزانی، پـێکلایی، بەئەمەکی 2 پـەیمان‌راسـتی، بەڵـێن‌راسـتی، راسـتی، دروسـتی، سەرراسـتی، سـاغی 3 راسـتی، دروسـتی ◌ 1 وفـاداری 2 صحت، صداقت 3 درستی، دقت

**fidget** /'fɪdʒɪt/ *noun*

1 مـرۆی ئـارام‌لـێ‌هەڵـگیراو، ژان‌کـردوو، حەجمین‌لێ‌براو، بزێو، بەجرت‌وفرت، جرپن 2 (fidgets) جـرت‌وفـرت، جرپـەجرپ، بەلەپرووزێ، پەلەپرووزە، پەلـەفرتێ، پەلەفرتـە، ژان‌کردوویی، ئارام‌لێهەڵگیراوی ◌ 1 آدم بی‌قرار 2 (در جمع) بی‌قراری

**fidgety** /'fɪdʒɪti/ *adjective*

ئارام‌لێ‌هەڵگیراو، بزێو، نەسرەوتوو، بێ‌وەقرە، بـێ‌سـرەوت، ژان‌کـردوو، حـەجمین‌لـێ‌بـراو، بـەجرت‌وفـرت، جـرپن، بەپەلەپرووزەکـەوتوو، restless ◌ بی‌قرار

**fiducial** /fɪ'dju:ʃ(ə)l/ *adjective*

1 (ئەستێرەوانی، تکنیکی) جـێگیر، چەسـپیو 2 بـاوەڕی 3 سـپاردە، ئەمانـەتی ◌ 1 ثابـت 2 اعتمادی 3 امانتی

**fiduciary** /fɪ'dju:ʃəri, US fɪ'du:ʃieri/ *adjective, noun* (*pl.* fiduciaries)

*adj* 1 سـپاردە، ئەمانـەتی 2 بـاوەڕی *n* (feducirics، کـەس یـان کۆمپـانی) لێ‌ڕاپێنـراو، ئەمین‌دار، جێی‌متمانە، باوەڕپێ‌کراو، ئەمین ◌ *adj* 1 امانتی 2 اعتباری *n* (در جمع) معتمد، امین

**fidus Achates** /ˌfʌɪdəs ə'keɪti:z/ *noun*

دۆستی بەوەفا، مریدی بەئەمەگ (بنەڕەت: لاتین "ئەکیتازی بەوەفا" (هاوڕێی ئینیەز Aeneas لە ئانێنیدی *Aeneid* ڤیرژیل) ◌ رفیق یا مرید وفادار

**fie** /fʌɪ/ *interjection*

(کۆن و بە شۆخی) شوورەیی‌یە! عەیبە! لە تۆ ناوەشێتەوە! داڕزێ! داوەشێ! بمرە! ◌ خجالت دارە!

**fief** = 1 feud 2 fee

**field** /fi:ld/ *noun, adjective*

*n* 1 کێـلگە، مـەزرا، مووچـە، هێگـا، لەوەڕگـە، یورت، جێ‌لەوەڕ، چایەر: *a ploughed field* ◊ *a field of wheat* 2 مەیدان، گۆڕەپان، مەلـبەند، بـوار، پانتـایی، زەمینـە، راخسـتە، وار 3 نـاوە، ناوچە، ئارا، دەڤەر 4 جێگا، جێ، شوێن 5 مەودا 6 یاریگـە، دەشـت، مەیـدان (وەرزش) 7 تیمـە بەشـداری‌کردووەکـان، پێـشبڕکێ‌دەرەکـان 8 شـەڕگە، مەیـدان یـا گـۆڕەپـانی شـەڕ، ناوچـەی کرداری شـەڕی 9 بوار، زەمینـە، وار 10 بـواری خوێنـدن 11 هەتـەر، بڕ 12 کـاری کـرداری 13 مەیدانی کار 14 بواری یان مەیدانی مەگناتیـسی 15 دەستەی راو 16 بابەت یان چالاکی تایبەتی 17 (heraldry) رووی تێکـرا یـان کـشتی escutcheon ی؛ رووی بـادەوە، ئـالا، نیـشان medal مۆر seal یان کۆینێ کە شتێکی لەسەر کێشراوەتەوە *adj* مەیدانی ◌ *n* 1 مزرعه، چراگاه 2 میدان، حوزه، عرصه 3 ناحیه، منطقه 4 جـا، فـضا 5 فاصـله 6 زمـین (ورزش) 7 مـسابقەدهنـدگان 8 میدان جنگ 9 زمینه 10 رشتەی تحـصیلی 11 بـرد 12 کار عملی 13 میدان عمل 14 میدان مغناطیـسی 15 گروه شکار 16 موضوع یا فعالیـت خـاص 17 فیلد *adj* میدانی

**field-artillery** *noun*

تۆپ‌خانەی دەشتی ◌ توپ‌خانەی صحرایی

**field-basil** *noun*

کـاکووتی، مـشک‌تەرامـشیح، مـەرزەی کێفی ◌ مشک طرامشک، کاکوتی

**field-book** /fi:ldbʊk/ *noun*

کتێبی رووپێوی، رووپێونامە ◌ کتاب مـساحی

**field corn** *noun*

کێلگەی گەنمەشامی ◌ کشتزار ذرت

**field day** /fi:ld deɪ/ *noun*

1 رۆژی مەشق، رۆژی سـان (سـەربازی)، رۆژی مەیدان 2 رۆژی وەرزش یان سپۆرت (خوێندنگا) 3 رۆژی لێکۆڵـینەوە یـان گـەڕانی زانـستی ◌ 1

روز مانور 2 روز ورزش 3 روز تحقیق علمی
**fielder** /ˈfiːldə(r)/ *noun*
تۆپگرەوە، یاریزانی ئاخری یاریگا (کریکێت و بێیسبۆڵ) ۞ بازیکن انتهای زمین
**field events** *noun, pl.*
پێشبرکێکانی گۆرەپانی، وەرزشە گۆرەپانی‌یەکان ۞ مسابقات میدانی
**fieldfare** *noun*
جۆرێ ڕەشێشەی زلی کۆچەر [*Turdus pilaris*] ۞ نوعی توکا
**field-glasses** *noun, pl.*
دووربین (دەشتی) ۞ دوربین
**field gun** /ˈfiːldgʌn/ *noun*
تۆپی سووک، تۆپی دەشتی، تۆپی دەرەوە ۞ توپ صحرایی
**field hand** *noun*
کرێکاری کێڵگە ۞ کارگر مزرعه
**field hockey** *noun*
هاکی سەرمێرگ یا سەرچیمەن ۞ هاکی روی چمن
**field hospital** *noun*
نەخۆش‌خانەی دەرەوە یان دەشت ۞ بیمارستان صحرایی
**field house** *noun*
1 ژوور یان دیوی خۆگۆڕین 2 خانوو یان ماڵی یاریگا، خانووی گۆرەپان ۞ 1 رختکن 2 خانەی زمین بازی
**field magnet** *noun*
بوار یان مەیدانی مەگناتیسی ۞ میدان مغناطیسی
**field marshal** *noun*
سەرسپا، سەرئەرتەش، سەرلەشکر (پایەبەرزترین ئەفسەر لە سپای بریتانیادا) ۞ ارتشبد
**field mouse** /ˈfiːld maʊs/ *noun*, also wood mouse
(گیانەوەرناسی) مشکی دەشت ۞ موش صحرایی
**field mushroom** *noun*
(ڕووەکناسی) کارگ یان قارچکی دەشتی، کارگەدەشتانە [*Agaricus campestris*] ۞ قارچ صحرایی
**field mustard** = charlock
**field officer** *noun*
ماژۆر یان کۆلۆنێل لە ئەرتەش‌دا، ئەفسەرێکی پایەبەرز لە سپای بریتانیادا ۞ افسر رزمی
**field of honour** *noun*
گۆرەپان یان مەیدانی شانازی ۞ میدان افتخار
**field of view** = field of vision
**field of vision** *noun*
مەیدانی دیتن یا بینایی، شوێنی هەتەر، هەتەرایی، بڕی بینایی، چاوبڕ، گۆرەپانی بینایی ۞ میدان دید
**field piece** = field gun
**field research** *noun*
توێژینەوەی مەیدانی یا کرداری ۞ پژوهش میدانی

**fieldsman** /ˈfiːldzmən/ = fielder
**field spaniel** *noun*
جۆرێ ڕەگەزی سەگی ڕاوی سپانیایی ۞ نوعی سگ اسپانیایی
**field sports** *noun, pl.*
وەرزشەکانی دەشت، وەرزشە دەشتی‌یەکان ۞ ورزش‌های صحرایی
**fieldstone** *noun*
بەردێ کە بە شێوەی خۆرسکی خۆ بەکارهێنراوە ۞ فیلداستون
**field-test** *noun*
تاقی‌کردنەوەی کرداری یان لە شوێنی خۆی‌دا، تاقی‌کردنەوەی مەیدانی: *Laboratory and field tests have been conducted* ۞ آزمایش عملی
**field theory** *noun*
تیۆری مەیدانی یان کرداری ۞ نظریەی میدانی
**field trial** = field test
**field trip** *noun*
گەڕانی زانستی، گەشتی لێکۆڵینەوە یان زانستی ۞ سفر علمی
**fieldwork** /ˈfiːldwɜːk, US -wɜːrk/ *noun*
1 کار لە جێی خۆی‌دا، لێکۆڵینەوەی مەیدانی (لە دەرەوەی تاقیگا یان پۆل) 2 سەنگەردانانی کاتی، شووورەدانان و سەنگەربەندی دەشتی ۞ 1 پژوهش میدانی 2 استحکامات موقت
**fieldworker** *noun*
لێکۆڵەری لە شوێنی خۆی‌دا، لێکۆڵەری مەیدانی ۞ پژوهش‌گر میدانی
**fiend** /fiːnd/ *noun*
1 دێو، شەیتان 2 ڕۆحی خراپ(کار)، ڕۆحی گڵاو یان پیس 3 بنیادەمی پیس، خوێڕی، گڵاو 4 مرۆی بێ‌بەزەیی، دڵڕەق، زاڵم، شێتی...، کوشتەی...، مردووی...، گیرۆدە ۞ 1 شیطان 2 روح پلید 3 آدم خبیث، فرومایه 4 آدم قسی‌القلب 5 دیوانەی.... معتاد
**fiendish** /ˈfiːndɪʃ/ *adjective*
1 دڵڕەق، بێ‌بەزەیی، درندە، زاڵم، زۆردار، بێ‌بەزەیی‌یانە، شەیتانی: *took a fiendish pleasure in hurting people* ◊ *a fiendish act* 2 سەخت، گران، دژوار: *a fiendish problem* 3 زیرەکانە: *a puzzle of fiendish complexity* 4 یەکجار *a fiendish plan* ◊ خراپ، ناخۆش ۞ 1 قسی‌القلب، بی‌رحمانە 2 شاق 3 زیرکانە 4 فوق‌العادە بد
**fiendishly** /ˈfiːndɪʃli/ *adverb*
بێ‌داد، یەکجار، زۆر ۞ فوق‌العادە، خیلی
**fiendishness** /ˈfiːndɪʃnəs/ *noun*
بێ‌بەزەیی‌یتی، دڵڕەشی، دڵڕەقی، زاڵمی ۞ بیرحمی، قسی‌القلبی
**fiendlike** /ˈfiːndlaɪk/ *adjective*

دیوئاسا، شەیتانئاسا ۞ شیطانصفت

**fierce** /fɪəs, US fɪrs/ *adjective*

1 توورە، توندوتیژ، رقهەستاو، بێبەزەیی، دڕ، درندە، بۆهاتوو، یانیگر، هار، هۆف: *a fierce dog* 2 *Two fierce eyes glared at them* ◊ توند، سەخت، گەرم قورس، بێئەمان، بەهێز 3 بێرەحم، بێبەزەیی، زۆردار ۞ 1 خشن، بیرحم، وحشی، سبع 2 شدید 3 بیرحم

**fiercely** /fɪəsli, US fɪrsli/ *adverb*

توند، بە توندی: *'Let go of me,' she said fiercely* ۞ شدیداً

**fierceness** /fɪəsnəs, US fɪrsnəs/ *noun*

1 هاری، دڕی، درندەیی 2 توندوتیژی، توندی ۞ 1 سبعیت 2 شدت

**fieri facias** /ˌfʌɪərʌɪ ˈfeɪʃɪas/ *noun*

(لاتین) بڕیاری جێبەجێکردن یان ڕاپەڕاندن ۞ حکم اجرا

**fierily** /ˈfaɪərəli/ *adverb*

1 توند، بە توندی 2 گڕگرتووانە ۞ 1 تند 2 به طور شعلەور

**fieriness** /ˈfaɪərnəs/ *noun*

1 گڕگرتوویی، داگیرساوی 2 سووربوونەوە، توندی، جینگزێتی 3 بەتینی، گەرمی، گوڕ ۞ 1 شعلەوری 2 برافروختگی 3 حرارت

**fiery** /ˈfaɪəri/ *adjective* (fierier, fieriest)

1 گڕگرتوو، داگیرساو، کڵپەکردوو، ئاورین، ئاگرین، ئاگرئاسا، شێوەئاور 2 گڕکێش، زووئاورگرتوو، گڕاڵ، زوو(ئاگر)گرتوو: *a fiery vapor* :flammable 3 سوور، سووورباو، زووتووڕە، جینگزی، فیشەکی، سەرتوند، سوورەوەبوو 4 تیژ، دۆخ، توند (چێشت) 5 لەشەوق، بەگوڕ، لەگوڕ، لەجۆش، بەتین، بەکەیف، شاد، سەرخۆش ۞ 1 شعلەور 2 اشتعالپذیر 3 قرمز، جوشی، برافروختە (چهرە) 4 تند (غذا) 5 پرحرارت، سرحال

**fiesta** /fiˈestə/ *noun*

جێژن، جەژن (ئایینی، لە وڵاتانی سپانیاییزماندا) ۞ عید

**FIFA** /ˈfiːfə/ *abbreviation* Fédération Internationale de ffootball Association

فیفا (= فیدراسیۆنی جیهانی (یا نێونەتەوەیی) تۆپێن (یان تۆپیێن) ۞ فیفا

**fife** /faɪf/ *noun*

فلووت (بنەڕەت: لە *Pfeife* ئەڵمانی "pipe" یان *fifre* فەرەنسی لە *Pfifer* ئەڵمانی سویسییەوە "piper") ۞ فلوت

**fifer** *noun*

فلووتژەن ۞ فلوتنواز

**fifteen** /ˌfɪfˈtiːn/ *adjective, noun*

*adj* پازدە، پانزە *n* 1 ژمارەی پازدە، ڕەنووسی پازدە 2 تیمی 15 کەسەی ڕاگبی ۞ *adj* پانزدە *n* 1 عدد پانزدە 2 تیم راگبی

**fifteenth** /ˌfɪfˈtiːnθ/ *noun*

پازدەیەم، پازدەهەم، پازدەیەمین، پازدەیەک ۞ پانزدهم، پانزدهمین، یکپانزدهم

**fifth** /fɪfθ/ *ordinal number, noun, adjective*

*n* پێنجیەک *adj* پێنجەم، پێنجەمین ۞ *n* یک پنجم *adj* پنجم(ین)

**fifth column** *noun*

ستوونی پێنجەم ۞ ستون پنجم

**fifth columnist** *noun*

فەرمانبەری ستوونی پێنجەم، ستوونی پێنجەم ۞ ستون پنجم

**fifth-generation** *adjective*

بەرەی پێنجەم (ئاماژە بە چینی نوێی کامپیوتێر یان زمانی بەرنامەنووسی کە هۆشی دەسکرد تیا ڕەنگ دەداتەوە) ۞ نسل پنجم

**fifth wheel** *noun*

1 تایە یان پێچکەی زاپاس یان یەدەک یان دەژ 2 (نافەرمی) شت یان مرۆی ناپێویست و زیادی ۞ 1 لاستیک زاپاس 2 چیز یا آدم زائد

**fiftieth** /ˈfɪftiəθ/ ordinal number *noun, adjective*

*n* پەنجایەک *adj* پەنجایەم، پەنجایەمین ۞ *n* یک پنجاهم *adj* پنجاهم(ین)

**fifty** /ˈfɪfti/ cardinal number *adjective, noun* (*pl.* fifties)

*adj* پەنجا، پێنجی: *She was born in the fifties* *n* ژمارە پەنجا، ڕەنووسی پەنجا ۞ *adj* پنجاه *n* عدد پنجاه

**fifty-fifty** *adjective, adverb*

*adj* نیوانیو، پەنجاپەنجا: *a fifty-fifty chance* *adv* سەدی پەنجا ۞ *adj* نصفانصف *adv* پنجاه درصد

**fifty pence** /ˌfɪfti ˈpiː/ *noun*

پەنجا پێنسی (کۆینێکی بریتانی، بایی 50 پێنس) ۞ پنجاه پنی

**fig**[1] /fɪɡ/ *noun*

1 هەنجیر، هەژیر، هژیر 2 داری هەنجیر [*Ficus carica*] 3 بۆ ناوی ئەو ڕووەکە پێوەندیدارانە بەکاردێنرێ، ب.ن. strangling fig (بنەڕەت: لەسەر بنچینەی *ficus* لاتین) ۞ 1 انجیر 2 درخت انجیر

**fig**[2] /fɪɡ/ *abbreviation* figure

**fig**[3] /fɪɡ/ *abbreviation* figurative

**fight** /faɪt/ *noun*

1 شەڕ، جەنگ 2 خەبات، بەرخۆدان، ئاوقابوون، بەرەنگاری، بەگژداچوون، توانایی بەرەنگاربوونەوە، وڕە، توانایی شەڕ، وزەی شەڕ، لەڕووڕاوەستان، ململانێ، مشتومڕ، قڕە، کێشە، پێکادان، بەربوونەیەک، لێکسەرەواندن، ئامبازییەکبوون 3 پێشبڕکێ 4 پێشبڕکێ

بۆکس یان شەڕەمشت ۞ 1 جنگ، نبرد 2 پیکار، مبارزه، قدرت نبرد 3 دعوا، نزاع، زدوخورد 4 مسابقه 5 مسابقەی مشتزنی

**fighter** /'faɪtə(r)/ *noun*
1 شەڕکەر، شەڕڤان، شەڕوان 2 خەباتکار 3 نەیار، هەڤرک، بەرچەپ 4 شەڕەمشتکار، بۆکسۆر 5 فڕۆکەی شەڕکەر ۞ 1 رزمنده 2 مبارز، پیکارگر 3 حریف 4 مشتزن 5 هواپیمای جنگنده

**fighting** *noun*
پێکادان، تێکهەڵچوون، شەڕ(وشۆڕ) ۞ درگیری

**fighting chance** *noun*
ئەگەری کەم ۞ احتمال ضعیف

**fighting cock** *noun*
کەڵەشێری لاری یان شەڕکەر ۞ خروس جنگی

**fighting fish** *noun*, also Siamese fighting fish
ماسییەشەڕکەرە، رەسەنی تایلەند [ *Betta splendens*] ۞ نوعی ماهی

**fighting forces** *noun, pl.*
هێزە شەڕکەرەکان ۞ نیروهای جنگی

**fighting words** *noun, pl.*, also fighting talk
(نافەرمی) وتە و قسەی شەڕهەڵگیرسێن، وتەی شەڕفرۆشانە یان مایەشەڕ ۞ کلمات جنگافروز

**fig leaf** *noun*
گەڵای هەنجیر، گەڵاهەژێر (بۆ داپۆشینی ئەندامە رەگەزییەکان، لە وێنەکێشی و پەیکەرتاشیدا، ئاماژە بە داستانی ئادەم و حەوا (Gen. 3:7) ۞ برگ انجیر

**fig marigold** *noun*
شەشبەری هەنجیری: هەریەک لە رووەکەکانی تۆخمی Mesembryanthemum، سەربە خێزانی carpetweed، گوڵەکانی سپی، زەرد یان پەمەیی بریقەدارن ۞ برگ انجیر

**figment** /'fɪgmənt/ *noun*, a figment of one's imagination
خەیاڵ، ئەندێشە، خۆف، گومان ۞ توهم، خیال

**fig-tree** /'fɪg tri:/ *noun*
داری هەنجیر ۞ درخت انجیر

**figuline** *noun*
هەرگینە، گلێنە ۞ سفالینه

**figural** /'fɪgjʊr(ə)l/ = figurative

**figuration** /ˌfɪgə'reɪʃ(ə)n, US -gjʊ-/ *noun*
1 شێوە، بیچم، روخسار 2 وێچواندن، شوبهاندن 3 خواستەمەنی، مەجاز، خوازە 4 وێنە ۞ 1 شکل 2 تشبیه 3 استعاره، مجاز 4 تصویر

**figurative** /'fɪgərətɪv, US 'fɪgjə-/ *adjective*
1 فیگورەییتیف، خوازەیی، emblematic، 2 وێنەیی: *-rative language* :metaphorical *-e sculpture* ۞ 1 مجازی، استعاری 2 تصویری

**figurative art** *noun*
هونەری وێنەیی یان دەرخەرانە ۞ هنر بازنمایی

**figuratively** /'fɪgərətɪvli, US 'fɪgjə-/ *adverb*
بە شێوەیەکی خوازەیی، بە شێوەی خوازە ۞ مجازاً

**figure** /'fɪgə(r), US 'fɪgjər/ *noun*
1 رەنووس، ژمارە، هێژمار: *the latest trade/sales/unemployment, etc. figures* ◊ 2 *Write the figure '7' on the board* بڕ (پارە) 3 بایی، نرخ 4 شێوە، بیچم 5 کۆتەڵ، پەیکەر: *a bronze figure of a horse* 6 خوازە، فیگور، راگوێست، خواستەمەنی 7 خستنەڕوو، پیشاندان (مرۆڤ یان گیانەوەری) 8 وێنە 9 نیشانە، هێما، کینایە 10 هێڵکاری، دیاگرام (کورتەکەی: .fig): *The results are illustrated in figure 3 opposite* 11 نەخش 12 شێوەی ئەندازەیی: *a five-sided figure* ◊ *a solid figure* 13 قیافە، قەدوباڵا، بەژنوباڵا، هەیکەل، باڵا: *She's always had a good figure* 14 کەسایەتی 15 مرۆ، بنیادەم، پیاو، کابرا، کەس: *a figure of authority* ◊ *a political figure* 16 (سکی، یاری سەرسەهۆڵ و هتد) کار، جوولە یان زنجیرە بزاوتێ: *The skater executed a perfect set of figures* 17 (موسیقا) برگە، گۆشە 18 (ویژە) هونەر 19 (figures) ژمێرە، حیساب: *Are you any good at figures?* ۞ 1 رقم، عدد 2 مبلغ 3 قیمت 4 شکل، ریخت 5 تندیس 6 مجاز، استعاره 7 بازنمایی، نمایش 8 تصویر 9 طرح 10 شکل هندسی 11 کنایه 12 نمودار 13 قیافه، ترکیب 14 شخصیت 15 آدم، شخص 16 حرکت یا سلسلەای از حرکات 17 (موسیقی) جمله 18 (ادبیات) صنعت 19 (در جمع) حساب

**figured** /'fɪgəd, US 'fɪgjərd/ *adjective*
نەخشاو، نەخشێنراو، گوڵدار، جوانکراو، رازێنراو: *figured muslin* ◊ *figured pottery* ◊ *figured wood*: portrayed ۞ منقوش

**figure eight** = figure of eight

**figurehead** /'fɪgəhed, US -gjərh-/ *noun*
1 پێشەکۆتەڵ، کۆتەڵ یان پەیکەری پێشەوەی کەشتی 2 رێبەری (هەر)بەناو (بە بێ دەسەڵاتی راستەقینە): *The president of the club is not just a figurehead* ۞ 1 تندیس جلوی کشتی 2 رهبر بدون قدرت

**figure of eight** *noun, pl.* figures of eight
سووڕان یان جوولەی هەشتی، هەشتەجووڵێ، هەشتەوانە ۞ حرکت هشتمانند

**figure of speech** *noun, pl.* figures of speech
1 خوازە، ئیستعارە، راگوێست، مەجاز، خواستەمەنی 2 وێچواندن، شوبهاندن ۞ 1 استعاره، مجاز، صنایع بدیعی 2 تشبیه

**figure skating** *noun*
یاری سەرسەهۆڵ ◌ پاتیناژ

**figurine** /'fɪgəri:n, US ˌfɪgjə'ri:n/ *noun*
پەیکەرۆکە، پەیکەرچە، کۆتەڵچە، کۆتەڵۆ(چ)کە، کۆتەڵی چکۆلانە ◌ تندیس‌چە

**figwort** /'fɪgaɜ:t/ *noun*
گەلاخوێنبەند؟: گیایێ بە گوڵی قاوەیی ئەرخەوانیباوی دووپل [توخم *Scrophularia*: چەندین جۆرن] ◌ نوعی گیاه

**Fijian** /fi:'dʒi:ən/ *noun, adjective*
*n* 1 خەڵکی فیجی، فیجیایی 2 زمانی Austronesian گەلی ڕەسەنی فیجی *adj* سەربە فیجی، خەڵکەکەی یان زمانەکەیان ◌ فیجایی

**fila** = filum

**filagree** /'fɪləgri:/ = filigree

**filament** /'fɪləmənt/ *noun*
1 لۆ، هەودا، داو، دەزوو، دەزوولە، تاڵ، چڵ 2 سیم، وایەر، تاڵ، ریشاڵە، رشتە (هی ناو گڵۆپ) 3 (رووەکناسی) لاسکە، ریشاڵە، میلە (ئەو بەشەی کەوا پۆرگ anther رادەگرێ) ◌ 1 تا، نخ 2 رشتە، افروزە 3 رشتە

**filamentary** /fɪlə'məntərɪ/ *adjective*
تاڵی، ریشاڵەیی، دەزووئاسا ◌ افروزەای، رشتەای

**filamentose** /fɪlə'məntəs/ *adjective,* also filamentous
تاڵئاسا، تاڵی، ریشاڵئاسا، ریشاڵی، دەزووئاسا ◌ رشتەای، رشتەمانند

**filar** *adjective*
تالاوی، ریشالاوی، تاڵی، تاڵتاڵ، ریشاڵئاسا، ریشاڵی، دەزوویی، دەزووواوی ◌ دارای رشتە، رشتەای

**filaria** /fɪ'lɛ:rɪə/ *noun, pl.* filariae /-rɪi:/
تاڵە، کرمی دەزوولەیی یا تاڵەیی [ژوورخێزان Filarioidea] ◌ پیوک

**filarial** *adjective*
تاڵەیی، سەربە کرمی دەزوولەیی یان تاڵەیی ◌ وابستە بە پیوک

**filature** /'fɪlətʃə, US -tjə/ *noun*
1 هەوریشمڕێسی 2 کارخانەی هەوریشمڕێسی ◌ 1 ابریشم‌تابی 2 کارگاه ابریشم‌تابی

**filbert** /'fɪlbət, US -bərt/ = hazel-nut

**file**[1] /faɪl/ *noun*
1 بڕبەند، کارتیخ، کارتک، ڕنە، ڕنەک، قەڵبە، خورۆک، مۆرە، مورەت 2 نینۆکساو، بڕبەندی نینۆک ◌ 1 سوهان 2 سوهان ناخن

**file**[2] /faɪl/ *noun*
1 تۆمارک، دۆسیە، پەروەندە 2 پێشینە، رابوردە، رابووری 3 تۆمارە، فایل (کامپیوتێر): *to copy a file* ◌ 1 پرونده 2 سابقە 3 فایل

**file**[3] /faɪl/ *noun*
1 ریز، لیزگە، کاروان، ڕیچکە، ستوون 2 (شەترەنج یان دامە) ریز ◌ 1 صف 2 خط

**file cabinet** = filing cabinet

**file clerk** = filing clerk

**filecutter** /'faɪlkʌtə(r)/ *noun*
بڕبەندکار، بڕبەندگەر، بڕبەندچی، کارتیخکار، بڕبەندەوان ◌ سوهان‌کار

**filefish** *noun, pl.* same or filefishes
زبرەماسی، ماسییەزبرە (زبرە و بڕبەندئاسا، زۆرتر لە دەریا گەرمەکاندا هەیە [خێزان Balistidae: زۆر جۆرن]) ◌ نوعی ماهی

**file-leader** /'faɪl li:də(r)/ *noun*
پێشەنگ، سەرجەلە، رچەشکێن، سەردەستە ◌ پیش‌آهنگ

**filename** /'faɪlneɪm/ *noun*
(کامپیوتێر) نێوی تۆمارە، ناوی فایل ◌ اسم فایل

**filer** *noun*
1 بڕبەندگەر، بڕبەندکار، بڕبەندچی 2 بەڵگەهەڵگر، تۆمارەوان ◌ 1 سوهان‌کار 2 بایگان

**filet** /'fi:leɪ, US 'fɪlɪt/ *noun*
تۆڕ ◌ تور

**filet mignon** /ˌfi:leɪ 'mi:njõ/ *noun*
لەتە گۆشتێکی مانگا ◌ فیله مینون

**filial** /'fɪliəl/ *adjective*
منالی، فرزەندی، ڕۆڵەیی، سەربە منالان: *-l affection/duty* ◌ فرزندی

**filially** /'fɪliəli/ *adverb*
منالانە، فرزەندانە، ڕۆڵەئاسا ◌ فرزندوار

**filiation** /ˌfɪlɪ'eɪʃ(ə)n/ *noun*
1 پێوەندی فرزەندی یان منالێتی، پێوەندی باوان و فرزەندی 2 بنەڕەت، ماک، بنەما، بنەچەک 3 پێوەندایەتی ◌ 1 رابطەی فرزندی 2 ریشە، اصل، نسب 3 نسبت

**filibeg** /'fɪlɪbɛg/ Scottish archaic= kilt, also philibeg

**filibuster** /'fɪlɪbʌstə(r)/ *noun*
1 وتار درێژکردنەوە، درێژدادڕی (لە پەرلەماندا، بۆ ڕێگرتن لە پەسندبوونی بەرنووس یان پرۆژەیێ) 2 درێژدادڕ، چەتتێخەر ◌ 1 اطالەی کلام 2 فیلیبوستر

**filicide** /'fɪlɪsʌɪd/ *noun*
1 منالکوژی، ڕۆڵەکوژی، فرزەندکوژی 2 فرزەندکوژ، ڕۆڵەکوژ ◌ 1 فرزندکشی 2 فرزندکش

**filiet** = fillet

**filiform** /'fʌɪlɪfɔ:m/ *adjective*
(زیندەناسی) دەزووئاسا، دەزوویی، تاڵی، ریشالانە ◌ نخ‌مانند

**filigree** /'fɪlɪgri:/ *noun,* also filagree
مەلیلەدروو(یی)، مەلیلەکاری، مەلیلەپیاگرتن، مەلیلەلێنی ◌ ملیلەدوزی

**filing** /'faɪlɪŋ/ *noun*
هەڵگرتن، بەڵگەهەڵگری ◌ بایگانی

**filing cabinet** *noun*
جێ‌فایل، قەفەسە، جێ‌تۆمارە ۞ قفسە
**filing clerk** *noun*, US file clerk
بەڵگەهەڵگر، بەرپرسی (بەڵگە)هەڵگرتن ۞ بایگان
**filings** *noun, pl.*
برادە، خاکەئاسن: *iron filings* ۞ برادە
**Filipina** *noun*
کچ یان ژنی فیلیپینی ۞ دختر یا زن فیلیپینی
**Filipino** /ˌfɪlɪˈpiːnəʊ, US -noʊ/ *adjective, noun*, also Pilipino, *fem.* Filipina /-nə/, *pl.* Filipinos or Filipinas
*adj* فیلیپینی، سەربە فیلیپین *n* 1 زمانی (Tagalog (ئەتەوەیی و شێوەی پەسندکراوی فیلیپینی 2 خەڵکی فیلیپین، فیلیپینی ۞ *adj* فیلیپینی *n* 1 زبانی فیلیپینی 2 اهل فیلیپین
**fill** /fɪl/ *noun*
بە ئەندازەی بەش‌کردوو، تەواو، ئەوندە کە بەش بکا ۞ بە قدر کفایت
**fille de joie** /ˌfiː də ˈʒwɑː/ *noun*
(فەرەنسی، جوان‌دەربڕی) خراپ‌کار، لەش‌فرۆش ۞ (حسن تعبیر) روسپی
**filler**[1] /ˈfɪlə(r)/ *noun*
پڕکەرەوە، پڕکەرە، پڕتەر، پڕتنە، ناوپڕ، لاپڕ، نێوبەرە، پواز، ناو، نێواخن، ناواخن ۞ پرکننده، لایی، تویی
**filler**[2] /ˈfɪlə(r)/ *noun, pl.* same
یەکەی پارەی Hungary، بەرامبەر بە سەدیەکی forint ۞ فیلر
**filler cap** *noun*
درگای باک، سەرەباک (بێنزین) ۞ در باک
**fillet** /ˈfɪlɪt, US fɪˈleɪ/ *noun*
1 نەرمە، (گۆشت) بێ‌ئێسک 2 قژبەست 3 سەربێن، ناوچاوبەست، سەربەست 4 بەنۆکە، باریکە، پەراوێزی باریک، تیژماڵک 5 لوولە، بۆری 6 (بیناسازی) گەچ‌بڕی یا نەخشی باریکە ۞ 1 فیله، بی‌استخوان 2 فیله 3 پیشانی‌بند 4 نوار، نوار باریک 5 لوله 6 (معماری) ابزار چهارگوش
**fill-in** *noun*
جێگر ۞ بدیل
**filling** /ˈfɪlɪŋ/ *noun, adjective*
*n* 1 پڕکردنەوەی ددان 2 ددانی پڕکردنەوە 3 ددانی پڕەوەکراو 4 پواز، کونگرە، نێواخن، ناو، پڕکەرە، نێوبەرە *adj* تێرەخۆرە (ژەمێ) ۞ *n* 1 پرکردن دندان 2 دندان پرکردنی 3 دندان پرکرده 4 لایی، تویی، سوراخ‌گیر *adj* شکم‌پرکن
**filling station** *noun*
پۆمپ یان وێستگەی بێنزین ۞ پمپ بنزین
**fillip** /ˈfɪlɪp/ *noun*
1 پەلەپیتکە، پیلکە، پلتۆک، پتە، پیتکە 2 ورووژێنەر، هاندەر 3 جووڵە، تەکان، جم‌وجۆڵ، جم، هاندان ۞ 1 تلنگر 2 انگیزان، انگیزش 3 تکان
**filly** /ˈfɪli/ *noun, pl.* fillies
1 جوانوو، جانوومایین، نۆما (دوو ساڵان)، بێچووە ئەسپ 2 (بە شۆخی) کچی لەجۆش، ژنی جەحێڵ ۞ 1 کرەی مادیان 2 فیلی
**film** /fɪlm/ *noun*
1 ناسکەبەرگە، توێژ، توێژاڵ، گەرداڵ، پەردە، رووپۆشی ناسک، پەردەی ناسک 2 فیلم (وێنەگری) 3 فیلم، توێژە، فلیم (سینەمایی)، ئاڵقەی فیلم 4 لێڵایی چاو 4 هەودا، داو، ریشاڵ، تاڵ 5 (films) کاری سینەما، سینەماکاری، سینەماگەری، پیشەسازی سینەما (بنەڕەت: *filmen* ئینگلیسی کۆن "membrane"، پێرەتێکی ئەڵمانی ڕۆژاوای هەیە، پێوەندی بە fell[3] ـەوە هەیە) ۞ 1 لایەی نازک، ورقە 2 فیلم 3 فیلم (سینمایی) 4 تاری چشم 5 رشتە 6 (در جمع) صنعت سینما
**filmable** *adjective*
شیاوی فیلم(لێ)هەڵگرتنەوە ۞ قابل فیلم‌برداری
**film archives** *noun, pl.*
فیلم‌خانە، ئەرشیفی فیلم ۞ بایگانی فیلم
**film cement** *noun*
چەسپی فیلم ۞ چسب فیلم
**film editing** *noun*
مۆنتاژی فیلم ۞ تدوین فیلم
**film editor** *noun*
مۆنتاژگەری یا ئێدیتۆری فیلم ۞ تدوین‌گر فیلم
**film festival** *noun*
فێستیڤاڵی فیلم ۞ جشنوارەی فیلم
**filmic** /ˈfɪlmɪk/ *adjective*
سینەمایی، فیلمی، سەربە فیلم (filmically *adv*) ۞ سینمایی، وابستە بە فیلم
**filmgoer** *noun*, US usually moviegoer or BrE also cinema-goer
فێرەسینەما، سینەمارەو، سینەماباز، بۆ سینەماچوو ۞ سینمارو
**filming** /fɪlmɪŋ/ *noun*
فیلم‌هەڵگری: *filming was delayed because of bad weather* ۞ فیلم‌برداری
**film library** *noun*
فیلم‌خانە، ئەرشیفی فیلم ۞ بایگانی فیلم
**film-maker** *noun*
فیلم‌دروسکەر، فیلم‌ساز ۞ فیلم‌ساز
**film-making** *noun*
فیلم‌دروسکردن، فیلم‌سازی ۞ فیلم‌سازی
**filmography** /ˌfɪlˈmɒgrəfi, US -ˈmɑːg-/ *noun, pl.* filmographies
فیلم‌ناسی، لیستی فیلمەکانی دەرهێنەر، ئەکتەر یان دەربارەی بابەتێکەوە ۞ فیلموگرافی
**film première** *noun*
شەوی یەکەم یان هەوەڵی پیشان‌دانی فیلم ۞

شب نخست نمایش فیلم
**film script** *noun*
فیلمنامە ◌ فیلمنامه
**filmsetting** = photocomposition
**film star** *noun*
ئەستێرەی فیلم یان سینەما ◌ ستارەی سینما
**film stock** *noun*
فیلمی خاو ◌ فیلم خام
**film-strip** /'fɪlmstrɪp/ *noun*
1 باریکە یا شریتی فیلم 2 باریکەی وێنەکان ◌ 1 نوار فیلم 2 نوار صور
**film studio** *noun*
ستودیۆی فیلمهەڵگرتنەوە یا فیلمهەڵگری ◌ استودیوی فیلمبرداری
**film-taking** *noun*
فیلمهەڵگرتنەوە، فیلمهەڵگری ◌ فیلمبرداری
**film test** *noun*
تاقیکردنەوەی ئەکتەر لە فیلمدا، تاقیکردنەوەی ئەکتەری ◌ آزمون هنرپیشگی
**filmy** /'fɪlmi/ *adjective* (filmier, filmiest)
ناسک، تۆڕی، گیانبەدەرەوە، تەنک، رووتەنک، تویژاڵئاسا: *a filmy cotton blouse* ◌ فرانما، لایەمانند، بدن‌نما
**filo** /'fi:ləʊ/ = filo pastry
**Filofax** /'faɪləʊfæks, US -loʊ-/ *noun*
(دروشمی بازرگانی) فیلۆفەکس (دەفتەریکی چکۆلە کە پەرەکانی ئەتوانرێ لێبێتەوە یان بخرێتەسەر) ◌ فیلوفکس
**filo pastry** /'fi:ləʊ ˌpeɪstri, US 'fi:loʊ/ *noun*
فیلۆپاستری، شیرینی لۆلۆ ◌ فیلو پاستری
**filopodium** /ˌfaɪlə(ʊ)'pəʊdɪəm/ *noun, pl.* filopodia
(زیندەناسی) پێدرزۆنەی دریژ و باریک، پادەزوو ◌ فیلوپودیم
**filose** /'faɪləʊs/ *adjective*
تاڵ‌تاڵ، ریشاڵریشاڵ ◌ نخ‌نخ
**filoselle** /'fɪlə(ʊ)sel/ *noun*
هەوریشمی خراپ ◌ ابریشم پست
**filovirus** /'fi:ləʊˌvaɪrəs/ *noun*
فیلۆڤایرۆس (= ڤایرۆسی RNAی ریشاڵئاسای کۆمەڵێ کە دەبنەهۆی تای خوێنپژانی ئاستەم، خێزانی Filoviridae) ◌ فیلوویروس
**fils**[1] /fɪls/ *noun, pl.* same
یەکەی پارەی ئێراق، بەحرەین، ئۆردۆن، کویت و یەمەن، بەرامبەر بە سەدیەکی riyal لە یەمەن و سەدیەکی dinar لەوانی دی ◌ فلس
**fils**[2] /fi:s, French fis/ *noun*
دوای ناوی خێزانی یان پاشناو بۆ جیاکردنەوەی کوڕ لە باوک کە ناویکیان هەیە ◌ فیس
**filter** /'fɪltə(r)/ *noun*
1 پاڵێوک، پاڵێونە، پاڵوێنە، پاڵێوکە، پاڵێونەک، پارزنۆک، داپێزە، ئاوپاڵێو 2 (هاتوچۆ، بریتانیا) نیشانەی بادانەوە بۆ لای چەپ 3 (کامپیوتێر) پاڵێوک، فیلتێر 4 (تافەرمی) جگەرەی پاڵێودار یان فیلتێردار ◌ 1 صافی، پالایه 2 علامت اجازەی حرکت به سمت چپ 3 و 4 فیلتر
**filterable** *adjective*, also filtrable
لەپالاوتنهاتوو، دەپالێوری، بە پاڵێوکا تێدەپەڕێ (filterableness *n* ،filterability *n*) ◌ قابل پالایش، قابل گذر از صافی یا پالایه
**filterable virus** *noun*, also ultravirus
ڤایرۆسی پاڵێو(ک)تێپەڕ، ڤایرۆسێ کە ئەوندە وردە کە بە پاڵێوکی دژەبەکتریا bacteria-retaining filter تێدەپەڕێ ◌ نوعی ویروس
**filter bed** *noun*
پاڵێوکی زیخی، بنک یان تەرکی پاڵێوک ◌ بستر پالایه
**filter disc** *noun*
پەپکەی پالاوتن، سێلکی پاڵێوک ◌ دیسک صافی
**filter-feeding** *adjective*
(گیانەوەریکی ئاوی) پالاوتەخۆر (filter-feeder *n*: گیانەوەری پالاوتەخۆر، وەک sponge، clam و baleen whale) ◌ بستر پالایه
**filter-paper** /'fɪltə(r)peɪpə(r)/ *noun*
کاغزی پاڵێوک، کاغزی پالاوتن ◌ کاغذ صافی
**filter press** /'fɪltəpres/ *noun*
پەستانەپاڵێو ◌ صافی فشاری
**filter tip** *noun*
1 کنگەسیگار، جگەرەپاڵێو، پاڵێوکی جگەرە، ئاغزە 2 جگەرەی فیلتێردار (filter-tipped *adj*: پاڵێودار، فیلتێردار) ◌ 1 فیلتر سیگار 2 سیگار فیلتردار
**filth** /fɪlθ/ *noun*
1 پیسی، دژوێنی، چڵک، چەپەڵی، گەماری، ناخاوێنی، چڵکنی 2 جنێو، قسەی ساردوسووک، قسەی هەرزانە: *How can you read such filth?* 3 ناشیرینی، ناحەزی، هەرزەیی 4 (تافەرمی، بریتانیا، سووکانە) پۆلیس ◌ 1 کثافت، پلیدی، نجاست 2 ناسزا، فحش 3 زشتی، فساد 4 پلیس
**filthness** /'fɪlθnəs/ *noun*
پیسی، چڵک، دژوێنی، چەپەڵی ◌ کثافت
**filthy** /'fɪlθi/ *adjective* (filthier, filthiest)
1 پیس، چڵکن، چەپەڵ، دژوێن، گواوی: *filthy rags/streets* 2 ناشیرین، ناحەز، هەرزانە: *filthy language/words* 3 یەکجار، لەرادەبەدەر (filthiness *n* ؛filthily *adv*) ◌ 1 کثیف، مبتذل 2 فوق‌العاده
**filtrate** /'fɪltreɪt/ *noun*
شتی پاڵێوراو، پالاوتە ◌ چیز صاف‌شده
**filtration** /fɪl'treɪʃn/ *noun*
پالاوتن، پارزنین (filtratable *adj*) ◌ صاف

کردن، تصفیه

**filum** *noun, pl.* fila

دەزوو، تاڵ، تاڵۆچکە، پێکهاتەی تاڵی، filament ◌ رشته، رشتەی کوچک

**fimbria** /ˈfɪmbrɪə/ *noun, pl.* fimbriae /-iiː/

(تویکاری) ریشوو، ریشۆڵە، پەرە (ب.ت. قیتکەیەکی ریشۆڵەئاسا لە کۆتایی لوولەی منالدان، لاتین "fringe ،border") ◌ ریشه

**fimbrial** *adjective*

ریشوویی، ریشۆڵەیی، پێوەندی بە ریشۆڵەوە هەیە ◌ وابسته به ریشه

**fimbriated** /ˈfɪmbrɪeɪtɪd/ *adjective.* also fimbriate

ریشوودار، ریشۆڵەدار، پەراوێزدار ( fimbriation *n*) ◌ ریشەدار، حاشیەدار

**fin** /fɪn/ *noun*

1 باڵ، باڵە 2 پەرە، پەرەکە (finless *adj*: بێباڵ، بێپەرەکە، بێپەر؛ finned /fɪnd/ *adj*-: پەردار، باڵدار، پەرەکەدار) ◌ 1 باله 2 پره

**finable** /ˈfaɪnəbl/ *adjective*

بەرێزاردن کەوتوو، بەرجەریمەکەوتوو، جەریمەلەسەر، دەبێ بیبژێرێ ◌ مشمول جریمه

**finagler** *noun*

بەدەس هێنەر بە فێڵەوە، لەخشتەبەر ◌ بدستآورنده با حیله

**final** /ˈfaɪnl/ *adjective, noun*

1 *adj* دوایین، کۆتایی، ئەنجامی، ئاخر، ئاخری، دوایی، هەرەدوایی: *his final act as party leader* 2 یەکلایی کەرەوە، بێ چەندوچوون، بێ ئەوملاوئەولا *n* 1 دوایێشبڕکێ 2 دوا(یین)چاپ (رۆژنامە) 3 (مۆسیقا) نۆتی سەرەکی 4 mode (finals) تاقیکاری یەکانی دوایی ساڵ، تاقیکاری یەکانی کۆتایی ◌ *adj* 1 نهایی، پایانی، آخرین 2 قطعی *n* 1 فینال 2 آخرین چاپ 3 (موسیقی) نت اصلی 4 mode (در جمع) امتحانات نهایی

**final clause** *noun*

(ڕێزمان) مەبەستدەربڕ ◌ فینال کلوز

**finale** /fɪˈnɑːli, US fɪˈnæli/ *noun*

1 بەشی دوایی، ئەنجامە، فینالی (مۆسیقا و دراما) 2 کۆتایی، دوایی، ئاخر (لە ئیتاڵیایی یەوە) ◌ 1 پایانه 2 آخر

**finalist** /ˈfaɪnəlɪst/ *noun*

1 یاریزانی خولی کۆتایی، بەشداریکەر لە پێشبڕکێی کۆتایی دا: *an Olympic finalist* 2 خوێندکاری ساڵی دوایی ◌ فینالیست

**finality** /faɪˈnæləti/ *noun, pl.* finalities

1 بێ ئەملاوئەولابوون، یەکلایی کەرەوەیی، بێ چەندوچوونی، تەواوێتی، مۆگەرێتی 2 کۆتایی، دوایی، ئاخر ◌ 1 قطعیت، حتمیت 2 پایان

**finalization** *noun*

بردنەسەر، گەیاندنەسەر، تەواوکردن، جێبەجێ کردن، یەکلایی کردن، یەکسەرەکردن، کۆتایی پێهێنان ◌ تکمیل

**finally** /ˈfaɪnəli/ *adverb*

1 ئاخر، پاشجار، ئاقیبەت، ئاخرسەر، لە کۆتایی دا، سەرەنجام، eventually: *The law was finally passed in May 2009* 2 بە شێوەیێکی یەکلایی کەرەوە: *The matter was not finally settled until later* ◌ 1 بالأخره، در پایان، سرانجام 2 به طور قطعی

**final product** *noun*

دوابەرهەم، دوایینبەرهەم، بەرهەمی کۆتایی یان (هەرە)دوایی ◌ فرآورده یا محصول نهایی

**final solution** *noun.* often capitalized F&S

بڕیاری کۆتایی: سیاسەتی نازی (1941-5) فەوتاندنی جوولەکەی ئەورووپا (بنەرەت: وەرگێڕدراوی *Endlösung* ئەڵمانی) ◌ فینال سولوشن

**finance** /ˈfaɪnæns, US faɪˈnæns, fəˈnæns/ *noun*

1 بەڕێوەبەرایەتی (کاروباری) دارایی 2 توانایی ماڵی یان دارایی، پارە، سەرمایە 3 بودجە، دابینکردنی بودجە 4 دارایی 5 سەرمایەنانەوە، دابینکردنی سەرمایە 6 پارەدان، پارەبەقەرزدان 7 (finances) سەرچاوە دارایی یەکان، دارایی، سەرمایە، دەسمایە ◌ 1 ادارەی امور مالی 2 پول، سرمایه 3 بودجه، تأمین بودجه 4 دارایی 5 سرمایه‌گذاری 6 تأمین مالی 7 (در جمع) منابع مالی

**finance company** *noun,* also finance house

دەزگا یان کۆمپانی پارە بەقەرزدان (بۆ کڕینی بەپاژ) ◌ شرکت یا مؤسسەی تأمین مالی

**financial** /faɪˈnænʃl, US fəˈnæ-/ *adjective*

دارایی، سەربە دارایی: *to be in financial difficulties* ◌ مالی

**financial crisis** *noun*

قەیرانی دراوی، قەیران یان تەنگژەی دارایی ◌ بحران مالی

**financially** /-ʃəli/ *adverb*

لەباری دارایی یەوە ◌ از نظر مالی

**financial ratios** *noun, pl.*

ڕێژە دارایی یەکان، ڕێژەگەلی دارایی ◌ نسبت‌های مالی

**financial year** *noun*

ساڵی دارایی ◌ سال مالی

**financier** /faɪˈnænsiə(r), US fə-, ˌfɪnənˈsɪr/ *noun*

1 شارەزای دارایی، دارایی ناس 2 سەرمایەنەرەوە، وەبەرهێن ◌ 1 کارشناس امور مالی 2 سرمایه‌گذار

**finch** /fɪntʃ/ *noun*

سەیرە، سیرە: باڵندەیێکی دەنگخۆشی کۆمەڵێکی بەربلاو کە ،chaffinch ،goldfinch

linnet ـەکان و هتد دەگرێتەوە، دەنووکیان کەتە و پەروباڵیان رەنگینە [زۆر جۆرن، ب.ت. لە خێزانی Fringillidae] ۞ سهره

**find** /faɪnd/ *noun*

1 دۆزینەوە، دیتنەوە، پەیداکردن، دۆزمان: *an archaeological find* 2 (شتێکی) دۆزراوە، دیتراوە، دۆزەوە، دۆزە (findable *adj*؛ ئەڵمانی بنەڕەت) ۞ 1 کشف 2 (چیز) یافته

**finder** /ˈfaɪndə(r)/ *noun*

1 دۆزەرەوە، پەیداکەر، ـدۆز 2 دووربینی پەیداکردنی شتێ بۆ روانین 3 = viewfinder ۞ 1 یابنده، ـیاب 2 دوربین ردیاب

**fin de siècle** /ˌfæ̃ də ˈsjekl/ *adjective*

سەربە (کۆتایی) سەدەی نۆزدەیەم، سەدەی نۆزدەیەمی (هونەر، ویژە و شێوازەکانی؛ بنەڕەت: فەرەنسی "end of century") ۞ وابسته به قرن نوزدهم

**finding** /ˈfaɪndɪŋ/ *noun*

1 دۆزینەوە، دیتنەوە 2 دۆزراوە، دیتراوە، دۆزە: *The findings of the commission will be published today* 3 (ماف) بڕیار، را 4 پشکنینەری گومرک 5 (findings) دۆزینەوەکان، ئەنجامەکان، دۆزراوەکان 6 (ماف) بڕیار، را ۞ 1 کشف 2 یافته 3 حکم 4 بازرس گمرک 5 (در جمع) یافتەها، کشفیات 6 حکم

**fine**[1] /faɪn/ *adjective* (-er, -est), *adverb, noun*

*adj* 1 باش، خاس، چاک، زۆر باش، خۆش، جوان، رند، چەلەنگ 2 (هەوا) خۆرکەوتوو، خۆرویان، تاوویان، نابارانی، ساو، روون 3 بەکەیف، بەدەماخ، لەش‌ساغ، ساغ 4 ناسک 5 گونجاو، باش 6 ورد، ئاردەبێژ، نەرم 7 باریک، ناسک، نەرم، ئاوەڕیس، موویین 8 (دەرزی و هتد) تیژ، نووک‌تیژ 9 پەتی، ناتێکەڵ، پوخت، پاڵێوراو 10 تەواو، بەس 11 خراپ، شپرزە 12 (نووسراوە و وتار) تەق‌وڕەق 13 (تافەرمی) قایلکەر 14 (هەستوکو) پاڵێوراو، بەرز *adv* 1 باش، زۆرچاک، فرەخاس 2 ناسک، باریک *n* وردەی کانگا یان لێکردن (ئارد) ۞ *adj* 1 خوب، زیبا 2 آفتابی 3 سرحال 4 ظریف 5 مناسب 6 ریز، نرم 7 نازک، نرم، لطیف، باریک 8 تیز 9 خالص، ناب، تصفیه‌شده 10 کافی 11 افتضاح 12 پرتکلف 13 رضایتبخش 14 تصفیه‌شده *adv* 1 خوب 2 ظریف، باریک *n* فاین

**fine**[2] /faɪn/ *noun*

1 (پێ‌بڕەو) conclusion ،end 2 جەریمە، زیانە، بژێرە؛ in fine: کورت و کرمانجی، بە کورتی، ئاخرسەر، ئاقیبەت ۞ جریمه

**fine**[3] /fiːn/ *noun*

جۆرێ براندی یەکجار باشی فەرەنسی، لە مەی دڵۆپێنراو ۞ فین

**fine arts** *noun, pl.*

هونەرە جوانەکان (وێنەکێشی، پەیکەرتاشی و هتد) ۞ هنرهای زیبا

**fine-drawn** *adjective*

(تەناف و...) باریک، ناسک، زراف ۞ باریک

**Fine Gael** /ˌfiːnə ˈgeɪl/ *noun*

دوو پارتی سەرەکی کۆنەپارێزی کۆماری ئیرلەند ۞ فین گیل

**fine-grained** *adjective*

دەنک‌ورد، دان‌ورد ۞ دانەریز، ریزدانه

**finely** /ˈfaɪnli/ *adverb*

1 ناسک، ورد 2 زۆر، بە هەرەباشی ۞ 1 ظریف 2 خیلی، به طور عالی

**fineness** /ˈfaɪnnəs/ *noun*

باریکی، ناسکی، وردی، جوانی ۞ ظرافت، دقت، زیبایی

**the fine print** = the small print

**finery**[1] /ˈfaɪnəri/ *noun, pl.* fineries

خشڵ‌وزیو، خشڵ‌وزەنبەر، زێڕوزیو، جل‌وبەرگ و جەواهیرات: *The mayor was dressed in all his finery* ۞ زر و زیور، تجملات

**finery**[2] /ˈfaɪnəri/ *noun, pl.* fineries

کارخانەی پاڵاوتن یا پوختەکردنی کانزاکان ۞ کارخانەی تصفیەی فلزات

**fine herbes** /fiːnz ˈɛːb/ *noun, pl.*

گژوگیای تێکەڵکراو یان لێکدراو کە لە چێشت‌لێنان یا ئاشپەزیدا بەکاردێنرێ (بنەڕەت: لە فەرەنسەوە بە واتای fine herbs) ۞ فاین هربز

**fine-spun** *adjective*, also finespun

1 وردچن، ئاوەڕیس، باریک‌ڕیس، نەرم و خۆش 2 ناکرداری، خەیاڵی ۞ 1 ریزبافت 2 غیرعملی

**finesse** /fɪˈnes/ *noun*

1 وردی، وردەکاری، وردبوونەوە، ناسک‌کاری، شارەزایی 2 باشی، خاسی 3 زیرەکی ۞ 1 دقت، مهارت 2 خوبی 3 زرنگی

**fine structural** *adjective*

سەربە یان پێوەندی بە پێکهاتەی وردەوە هەیە، وردەپێکهاتەیی، وردەدارشتەیی، وردەسازەیی ۞ وابسته به ساختار ریز

**fine structure** *noun*

پێکهاتەی ورد، وردەپێکهاتە، وردەدارشتە، وردەسازە: وردەکاری پێکهاتنی خانەکان کە بە بەدەر لە توانایی دیتنی وردبین یان مایکرۆسکۆپی رووناکی‌یە و تەنیا بە وردبینی ئێلێکترۆنی دەبینرێ ۞ ساختار ریز

**fine-tooth comb** *noun*, go over something with a fine-tooth comv

1 شانەی (ددانە)ورد 2 تاقی‌کردنەوە شتێ بە وردی و سەرنجەوە، لە شتێ زۆر وردبوونەوە ۞ 1 شانەی دندانەریز 2 امتحان چیزی به طور دقیق

**fine-tuning** *noun*

میزان‌کردنی بە وردی (تەلەفزیۆن و رادیۆ) ۞

تنظیم

**finfoot** /'fɪnfʊt/ *noun, pl.* finfoots
جـــۆرێ باڵـــندەی ئـــاوی grebe ئاســـای دەنووکدرێژ [خێزان Heliornithidae: سێ جۆرن] ۞ نوعی پرنده

**finger** /'fɪŋgə(r)/ *noun*
1 قامک، تلی، پەنجە، کلک، پیلک: *Hold the material between finger and thumb* 2 قامکی دەسکێش یان لەپک 3 قامکێ (بە باری پانایی، بۆ ئەندازەی خواردنەوەی ئەلکوولی یان لیکـــوری) 4 (زەوی، نـــان وهتـــد) تیکـــە ۞ 1 انگشت 2 انگشت دستکش 3 بند انگشت 4 برش

**finger alphabet** *noun*
ئاوێتی قامکی، ئەلفوبێی پەنجەیی ۞ الفبای انگشتی

**fingerboard** /'fɪŋgəbɔːd, US 'fɪŋgərbɔːrd/ *noun*
دەسک، پەنجەگرە، تەختەقامک، قامکگیر، پەنجەگیر، جێقامک (ب.ت. گیتار، ڤیۆلۆن و هتد) ۞ رودسته

**finger bowl** *noun*
قامکشۆری، دەسشۆری، تاس، کاسە (بۆ دەس تیا شواردن، لە نێوان نانخواردنا) ۞ کاسه

**-fingered** *adjective*
(لـە لێکـدانا) ـــقامکـە، ـــقامـک، ـــپـەنجـە، ـەنگوست: *long-fingered* ۞ ـانگشتی، ـانگشت

**finger food** *noun*
چێشتی بە قامک خواردن ۞ فینگر فود

**finger hole** *noun*
کونە قامک، جێقامک، کون (لە ئامێری فوویی‌دا) ۞ جای انگشت

**fingering**[1] /'fɪŋgərɪŋ/ *noun*
پەنجەژەنی، قامکدانان، پەنجەلێدان، پەنجەدانان ۞ انگشت‌گذاری

**fingering**[2] /'fɪŋgərɪŋ/ *noun*
جۆرێ خوری باش بۆ چنین بە دەست ۞ فینگرینگ

**fingermark** /'fɪŋgəmɑːk, US 'fɪŋgərmɑːrk/ *noun*
جـێپەنجـە، شـوێنپەنجـە، شـوێنی قامـک، جێقامک ۞ جای انگشت

**fingernail** /'fɪŋgəneɪl, US -gərn-/ *noun*
نینوک، نینوخ، نینۆخ ۞ ناخن

**finger painting** *noun*
قامککێشی، بەقامککێشانەوە، وێنەکێشی بە دەس یان قامک (بەجێی بەکارهێنانی پێنووس و شتی تر) ۞ نقاشی با انگشتان

**fingerplate** /'fɪŋgəpleɪt/ *noun*
رووتەختی دەسکی درگا، بەردەسکەی درگا، پلەیتی دەسکی درگا (بۆ ئەوەی کە جێ قامکی پێوە دیار نەبێ) ۞ فینگرپلیت

**fingerpost** /'fɪŋgəpəʊst/ *noun*
تیری نیشاندان، تیرکی رێنوێنی(کردن) ۞ فلش

راهنما

**fingerprinting** /'fɪŋgəprɪntɪŋ, US -gərp-/ *noun*
پەنجەگرتن، جـێقامـک دیـاریکردن، جـێپەنجەهەڵـگرتنەوە (بـۆ ناسـینەوەی تاوانکاران) ۞ انگشت‌نگاری

**fingerprint** /'fɪŋgəprɪnt, US -gərp-/ *noun*
شوێنپەنجە، جێپەنجە، جێقامک، تەپل: *to take a suspect's fingerprints* ۞ اثر انگشت

**finger-spelling** *noun*
سپێلینگ بە قامک ۞ هجی کردن با انگشت

**fingerstall** /'fɪŋgəstɔːl/ *noun*
قامکپارێز، قامکەوانە، قامکەپۆش (بۆ قامکی بریندار) ۞ انگشتی

**fingertip** /'fɪŋgətɪp, US -gərt-/ *noun*
نووکی یا سەری قامک، پۆرتک، سەری پەنجە ۞ سر انگشت

**finial** /'fɪniəl/ *noun*
1 گومەز، قوبە 2 کەمەرە، سەرمنارە ۞ 1 قبه 2 گل‌دسته، سرمناره

**finical** /'fɪnɪk(ə)l/ *adjective*, also finicky
1 درەنگ‌رازی، بەبەهانە، بەئیراد 2 سەخت، دژوار، پرئەرک، پرزەحمەت (*adv* finically; *n* finicalness) ۞ 1 مشکل‌پسند 2 مشکل

**finicality** /fɪnɪ'kælɪtɪ/ *noun*
درەنگ رازیبوون، بەئیرادبوون ۞ مشکل‌پسندی

**finicky** /'fɪnɪki/ = finical

**fining** /'faɪnɪŋ/ *noun*
پالاوتن، پوختەکردن، پوختاندن ۞ تصفیه

**finis** /'fiːnɪs, 'fɪnɪs, 'fʌɪnɪs/ *noun*
دوماهی، کۆتایی، دوایی (لە کۆتایی کتێب یا فیلم، لە لاتینەوە) ۞ پایان

**finish** /'fɪnɪʃ/ *noun*
1 دوابەش، بەشی دوایی، دوایی، کۆتایی: *a dramatic finish to the race* 2 تەواوێتی 3 قۆناخی کۆتایی: *a gloss/matt finish* ۞ 1 بخش آخر، خاتمه 2 کمال 3 مرحله‌ی آخر

**finished** /'fɪnɪʃt/ *adjective*
تەواو، تەواوبوو، خ(ە)لاس‌کراو، کۆتایی‌پێهاتوو، جێبەجێکراو: *I won't be finished for another hour* ◊ *the finished product/article* ۞ تمام، تمام‌شده

**finisher** /'fɪnɪʃə(r)/ *noun*
1 تەواوکەر، کۆتایی‌پێهێن 2 بە هێڵی کۆتایی گەیشتوو: *The first six finishers go into the final* ۞ 1 اتمام‌کننده 2 به خط پایان‌رسیده

**finishing line** *noun*, US finish line
هێڵی کۆتایی، دواهێڵ ۞ خط پایان

**finishin school** *noun*
خوێندنگای پێگەیێنەر (فێرکردنی رێ‌وشوێنی کۆمەڵ(گا)) ۞ مدرسه‌ی معرفت‌آموزی

**finishing touches** *noun, pl.*
وردەکاری کۆتایی، دواوردەکاری، دوادەسکاری، دەسکاری ئاخر ◌ پرداخت نهایی
**finite** /'faınaıt/ *adjective*
1 سنووردار، دوادار، بەرتەسک، دیاریکراو، رادەمەند: ◊ *a finite number of possibilities* ◊ *finite* ◊ *The world's resources are finite* 2 *the finite velocity of light* ◊ *beings* (ریزمان) گەردانکراو، لەگەردانهاتوو (*finitely adv*) ◌ 1 متناهی، کرانمند، محدود 2 صرف‌شده
**finiteness** /'faınaıtnəs/ *noun*
سنووورداری، دواداری، بەرتەسکی، بەرتەنگی، دیاریکراوی، لەدوایی‌هاتوویی، رادەمەندی ◌ کرانمندی، محدودیت
**finite verb** *noun*
کاری لەگەردانهاتوو، کاری گونجاو ◌ فعل صرف‌شدنی
**finito** /fı'ni:təʊ/ = finished
**finitude** /'fmıtju:d/ *noun*
سنووورداری، دواداری، بەرتەسکی، بەرتەنگی، دیاریکراوی، لەدوایی‌هاتوویی، رادەمەندی ◌ کرانمندی، محدودیت، پایان‌پذیری
**fink** /fıŋk/ *noun*
1 سیخور 2 کەسێکی خوێڕی، مرۆی خوێڕی یان سووک ◌ 1 خبرچین 2 آدم پست
**Finn** /fın/ *noun*
خەڵکی فینلەند، فینلەندی ◌ اهل فنلاند
**finnan** /'fınən/ *noun*, also finnan haddock
فینان (= جۆرێ هەداک haddocی بۆدراو یان برژاو) ◌ فینان
**Finnic** /fınık/ *adjective*
1 ئاماژە یان سەربە کۆمەڵە زمانێکی Finno-Ugric کە فینلەندی و ئێستۆنیایی لەخۆدەگرێ 2 سەربە کۆمەڵی لە گەلان کە فینلەندی‌یەکان دەگرێتەوە ◌ 1 فینیک 2 وابسته به زبان فینلند
**Finnish** /fınıʃ/ *adjective, noun*
*adj* فینلەندی، فینلەندی، سەربە فینلاند *n* زمانی (فین-ئۆگرایی) فینلەندی‌یەکان ◌ *adj* وابسته به فنلاند *n* زبان فنلاندی
**Finno-Ugric** /ˌfınəʊ'u:gnk, -'ju:grık/ *adjective, noun,* also Finno-Ugrian /-'u:grıən, -'ju:grıən/
*adj* سەربە کۆمەڵی زمانانی فین-ئۆگرایی *n* کۆمەڵێکی مەزنی زمانانی ئۆرالی، کە فینلەندی، هەنگاریایی و چەندین زمانی ئاسیای ناوەندی لەخۆدەگرێ ◌ فین‌اوگرایی
**finny** /'fını/ *adjective* (finner, finniest)
(ویژەیی، بە شۆخی) شێوەماسی، ماسی‌ئاسا، پەرەکەدار، پەرەدار، خاوەن‌پەرە، باڵدار ◌ ماهی‌مانند، دارای پره یا باله
**fino** /'fi:nəʊ/ *noun, pl.* fonos
جۆرێ شێری تاڵی رەنگ‌رۆشن ◌ فینو
**fiord** = fjord
**fipple** /'fıp(ə)l/ *noun*
سەری recorder یا ئامێرێکی بایی وا کە هەوو دەکرێ بە نێویا ◌ نی‌انبان
**fipple flute** *noun*
مەشکە(نایە)، هەمبانە ◌ نی‌انبان
**fir** /fɜ:(r)/ *noun*
درەخت یان داری سنەوبەر، داروو‌ک، جۆرێکی هەمیشەسەوزی گەڵادەرزی یان [توخم *Abies*: زۆر جۆرن] ◌ درخت یا چوب صنوبر
**fir-cone** /fɜ: kəʊn/ *noun*, also fir cone
میوە یان بەری سنەوبەر ◌ میوه‌ی صنوبر
**fire** /'faıə(r)/ *noun*
1 ئاگر، ئاور 2 ئاورگرتن، سووتان، سووتمان، ئاوری ماڵوێرانکەر، گرتن، ئاورتێ‌بەربوون 3 (سەربازی) خستن، تەقاندن 4 کووورە 5 تین‌وگوڕ، داگیرسان، بەبەرۆشی، خرۆش، تامەزرۆیی 6 رەخنەی توند (*fireless adj*؛ *firer n*؛ بنەڕەتێکی ئەڵمانی رۆژاوای هەیە) ◌ 1 آتش 2 آتش‌سوزی 3 شلیک 4 بخاری 5 حرارت، اشتیاق 6 انتقاد شدید
**fire alarm** *noun*
لوورە (ی ئاگرگرتن) ◌ آژیر
**fire ant** *noun*
مێرووله‌ئاورە، چزووەکەی بەژانە، هی گەرمێنانی ئەمریکا [*Solenopsis invicta* و جۆرەکانی تر] ◌ نوعی مورچه
**firearm** /'faıərɑ:m, US -ɑ:rm/ *noun*
چەک، چەکی گەرم، چەکی ئاگرین ◌ اسلحه
**fire-back** *noun*
1 دیوارەی دواوەی کووورە 2 (هەروەها fireback pheasant) جۆرێکی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا بە پاشەڵی مەیلەوسوورەوە [توخم *Lophura*: سێ جۆرن] ◌ 1 جدار عقبی بخاری 2 نوعی قرقاول
**fireball** /'faıəbɔ:l, US 'faıərb-/ *noun*
1 بەردی ئاسمانی (گەورە و بەشەوق): *the primordial fireball associated with the beginning of the universe — Scientific American* 2 ئاگرەتۆپ، گۆی ئاورین 3 ناوەندی تەقینەوەی (چەکی) ناوکی 4 مرۆی زۆربەگوڕ، بەکار، ئاتەش‌پارە ◌ 1 شهاب 2 گوی آتش 3 هسته‌ی آتش 4 آدم بسیار پرانرژی
**firebase** *noun*
(سەربازی) بنکەی ئاگر ◌ پایگاه آتش
**firebird** *noun*
(باڵندەناسی) هەنجیرخورە ◌ پری شاهرخ
**firebomb** /'faıəbɒm, US 'faıərbɑ:m/ *noun*
بۆمبی ئاگرین ◌ بمب آتش‌زا

**firebox** /'faɪəbɒks/ *noun*
ئاتەش‌خانە، ئاگردان، کوورە، کوانوو ۞ آتش‌دان
**firebrand** /'faɪəbrænd, US 'faɪərb-/ *noun*
1 لەتێکی داری سووتاو، گرتوو، سەرەبزووت، چلۆسک، بسووت 2 کەسێکی ئاژاوەگێر، خوەمەشێوێنکە، گێرەشێوێن ۞ agitator ۞ 1 گیرانە 2 آدم فتنەانگیز، اخلال‌گر، آشوب‌گر
**firebreak** /'faɪəbreɪk, US 'faɪərb-/ *noun*
باریکایی یان بەربەستی ئاگربر، ئاگرکوژێن، کەرتی ئاگرکوژاندنەوە (دارستان) ۞ نوار آتش‌شکن
**firebrick** /'faɪəbrɪk, US 'faɪər-/ *noun*
خشتی ئاگرین، ئاجوری ئاورین ۞ آجر نسوز
**fire brigade** /'faɪə brɪgeɪd/ *noun*, also fire company
دەستەی ئاگرکوژێنەوە ۞ گروه آتش‌نشانی
**firebug** /'faɪəbʌg, US 'faɪər-/ *noun*
ئاگردەر، سووتێنەر، داگرتێبەردەر (بە ئەنقەست) ۞ آتش‌افروز
**fireclay** /'faɪəcleɪ/ *noun*
گلەسوورە، قوڕی خشتی ئاورین ۞ خاک نسوز
**fire company** *noun*
1 دەستەی ئاگرکوژێنەوە 2 کۆمپانی ئاگر (بۆ (کردنی) بیمە کاتی زیان و زەرەر لە ئەنجامی ئاگر دەکەوێتەوە) ۞ فایر کمپانی
**fire control** *noun*
1 ئامادەکاری و پلان‌ڕێژی تەقاندنەوە بۆ سەر ئامانج 2 مەهار(کردنی)ی ئاگرتێبەربوون یان سووتان، مەهار یان کۆنترۆلی ئاورکەوتنەوە ۞ 1 تدارک و برنامه‌ریزی تیراندازی به سوی هدفی 2 کنترل حریق
**fire coral** *noun*
شیلانی ئاور، جۆری hydrozoan شیلانی، خاوەنی nematocyst کە جزووەکەی بەژانە و دەگزێتەوە [توخم *Millepora*] ۞ فایر کورال
**firecracker** /'faɪəkrækə(r), US 'faɪərk-/ *noun*
(زۆرتر لە ئەمریکای باکووری) توقتوقە: *to let/set off firecrackers* ۞ ترقه
**firecrest** *noun*
(بالندەناسی) بۆبەئاورە؟ [*Regulus ignicapillus*] ۞ نوعی پرنده
**-fired** *adjective*
(لە لێکدانا) بە... ئەسووتێ، ی، سووت: *gas-fired central heating* ۞ ـسوز
**firedamp** /'faɪədæmp/ *noun*
گازی زۆنگاو، کانەگاز، میتان ۞ متان
**fire department** *noun*, fire bridge or fire service
دەستەی ئاگرکوژێنەوە ۞ گروه آتش‌نشانی
**fire drill** *noun*
مەشقی خۆدەربازکردن لە ئاور ۞ تمرین فرار از حریق
**firedog** /'faɪədɒg/ *noun*
سێپاچکەی بەر ئاگردان یان کوورە، سێپایەی کوورە ۞ آندریون
**fire door** *noun*
درگای ئاور(بەند)، بۆ بەرگیری لە بلاوبوونەوەی ئاور ۞ فایر ڈر
**firedrake** *noun*
(لە میتۆلۆژی ئەڵمانی‌دا) هەژدیهای ئاگرخۆر ۞ اژدهای آتش‌خوار
**fire-eater** /'faɪə i:tə(r)/ *noun*
1 ئاگرخۆر (چاوبەست) 2 کەسێکی جینگزی، شەڕانی (fire-eating *adj, n*) ۞ 1 آتش‌خوار 2 آدم دعوایی
**fire engine** /'faɪə ənsʒɪn/ *noun*, also fire truck
ماشێنی ئاگرکوژێنەوە ۞ ماشین آتش‌نشانی
**fire escape** /'faɪə ɪskeɪp/ *noun*
پلیکان یان نەردیوانی دەرچوون، پەیژەی هەلاتن ۞ پلکان یا نردبان فرار
**fire extinguisher** *noun*, also extinguisher
ئاگرکوژێنە، کەپسوولی ئاگرکوژاندنەوە ۞ کپسول آتش‌نشانی
**firefight** /'faɪəfaɪt, US 'faɪərf-/ *noun*
شەڕەئاگر، شەڕەگوللە، گۆڕینەوەی ئاگر ۞ مبادله‌ی آتش
**firefighter** /'faɪəfaɪtə(r), US 'faɪərf-/ *noun*
ئاگرکوژێنەوە، فەرمانبەری ئاگرکوژاندنەوە ۞ آتش‌نشان
**fire fighting** *noun*
ئاگرکوژاندنەوە ۞ آتش‌نشانی
**firefly** /'faɪəflaɪ, US 'faɪərf-/ *noun, pl.* fireflies, also lightning bug
گولەئەستێرە، گی ئاسارە، ئەستێرۆک [*Luciola lusitanica* (ئەورووپا) و جۆرەکانی تر] ۞ سوسک شب‌تاب
**fireguard** /'faɪəgɑ:d, US 'faɪərgɑ:rd/ *noun*
1 تۆڕی پاراستن، ئاگرپارێز، پەردەئاگر، پەردەکوورە (کوورەی دیواری) 2 باریکایی یان بەربەستی ئاگربڕی دارستان ۞ 1 حفاظ 2 نوار آتش‌شکن در جنگل
**fire hose** *noun*
شیلانکی ئاگرکوژاندنەوە ۞ شیلنگ آتش‌نشانی
**firehouse** /'faɪəhaʊs, US 'faɪərh-/ *noun, pl.* firehouses
وێستگەی ئاگرکوژاندنەوە لە شاری چکۆلەدا، fire station ۞ ایستگاه آتش‌نشانی در شهر کوچک
**fire hydrant** *noun*

شیرەی ئاگر کوژاندنەوە ◌ فلکەی آب آتش‌نشانی
**fire iron** *noun*
مەقاشی کوورەی دیواری ◌ فایرایرون
**firelight** /'faɪəlaɪt, US 'faɪərl-/ *noun*
رووناکی ئاگر، رۆشنایی ئاگر، شەوقی ئاور ◌ نور آتش
**firelighter** /'faɪəlaɪtə(r), US 'faɪərl-/ *noun*, also firestarter
داگیرسێنە، پێهەڵکەرە ◌ گیرانە
**fire line** /'faɪə laɪn/ *noun*
هێڵی ئاگر (لە تەنینەوە) ◌ خط آتش
**firelock** /'faɪəlɒk/ *noun*
(مێژوویی) تفەنگی پلیتەیی ◌ تفنگ فتیله‌ای
**fireman** /'faɪəmən, US 'faɪərmən/ *noun*, *pl.* firemen
1 ئەندامی دەستەی ئاگرکوژاندنەوە 2 توونچی، نێڵدەر ◌ 1 عضو گروە آتش‌نشانی 2 تون‌تاب
**fire opal** = girasol 2
**fireplace** /'faɪəpleɪs, US 'faɪərp-/ *noun*
کوورەی دیواری، ئاگردان، کوانوو، کوانگ، کۆماج، کولێن ◌ شومینە
**fire-plug** *noun*
شیرەی ئاگرکوژاندنەوە ◌ فلکەی آتش‌نشانی
**firepower** /'faɪəpaʊə(r), US 'faɪərp-/ *noun*
1 هێز یان توانایی ئاگرباراندن، هێزی وێرانکردن، هێزی ئاگر، هێزی تیرخستن 2 دەسەلات، هێز، دەس‌ڕۆیشتوویی: *The company has enormous financial firepower* ◌ 1 قدرت آتش 2 نفوذ
**fire point** *noun*
خاڵی سووتان، خاڵی ئاورگرتن، خاڵی گڕیان ◌ نقطەی اشتعال
**fire practice** = fire drill
**fireproof** /'faɪəpru:f, US 'faɪərp-/ *noun*
نەسووتاو، ئاورنەگر، دژەئاگر ◌ نسوز
**fire-raiser** *noun*
ئاورتێبەردەر، سووتێنەر، ئاگرتێخەر ◌ ایجادگر حریق
**fire-raising** *noun*
ئاورتێبەردان، ئاگرنانەوە، سووتاندن ◌ ایجاد حریق
**fire salamander** *noun*
جۆرێ salamander شەوگەڕی کلک‌کورتی پێست‌ڕەش، بە خاڵ و پنکەی زەرد و پرتەقاڵی [*Salamandra salamandra*] ◌ نوعی سمندر
**fire sale** *noun*
هەرزان‌فرۆشی‌کردنی کەل‌وپەلی سووتاو ◌ حراج اجناس آسیب‌دیدە
**firescreen** = fireguard
**fire service** *noun*
ئاگرکوژاندنەوە ◌ آتش‌نشانی
**fireship** /'faɪəʃɪp/ *noun*
کەشتی ئاورتێبەردەر ◌ حراقە
**fireside** /'faɪəsaɪd, US 'faɪərs-/ *noun*
گوێ‌ئاگردان، لای کوورە، پاڵ کوورە، تەنیشت کوورە ◌ کنار بخاری
**fireside chat** *noun*
قسەی بەرکوورە یا بەرئاگردان ◌ گپ خودمانی
**fire starter** = firelighter
**fire station** *noun*
وێستگە یان بنکەی ئاگرکوژاندنەوە ◌ ایستگاه یا پایگاه آتش‌نشانی
**fire-stone** /'faɪə stəʊn/ *noun*
بەردەچەرخ، بەردەچەخماخ ◌ سنگ چخماق
**firestorm** /'faɪəstɔ:m, US 'faɪərstɔ:rm/ *noun*
ڕەشەبای لە ئەنجامی ئاورگرتن ◌ توفان آتش
**firethorn** = pyracantha
**fire tower** *noun*
کەلووی ئاگرەوانی، کەلوو یا بڕجی چاودێری ئاورگرتن ◌ برج مراقبت حریق
**firetrap** /'faɪətræp/ *noun*
(وەک خانووبەرەیێ) سووتان‌لەسەر، لەبەر مەترسی ئاورگرتن یان سووتان، داوی سووتان ◌ در خطر آتش‌سوزی
**firewalker** *noun*
ئاوڕڕەو، ئاگربەزێن، بەنێو ئاوردا ڕۆیشتوو، لەئاورتێپەڕ (firewalking *n*: ئاوڕڕەوی، ئاگربەزێنی، بەنێو ئاوردا ڕۆیشتن، لەئاگرتێپەڕین (ئایینی)) ◌ عبورکنندە از آتش
**firewall** /'faɪəwɔ:l, US 'faɪərw-/ *noun*
1 دیواری ئاگر(گرتن)، ئاگرەدیوار، دیواری ئاگربەند 2 دیواری ئاگرین، ئاورەدیوار، ئاگرەدیوار: بەشێ لە دەزگای یان تۆڕ network کە وا داڕێژراوە ڕێگە نادا بە خەڵک دەستیان بە کامپیوتێرێکی یەکێکی تر ڕابگا (ئەو کاتەی بە ئینتێرنێت بەستراوەتەوە) ◌ 1 دیوار 2 فایروال
**fire warden** *noun*
بەرپرسی ئاورگرتن (بۆ بەرگرتنی) ◌ مسؤل آتش
**firewatcher** *noun*
چاودێری ئاورگرتن (بۆمباران و لە درێژایی شەڕدا) ◌ مراقب حریق
**firewatching** *noun*
چاودێریی ئاورگرتن ◌ مراقبت حریق
**firewater** /'faɪəwɔ:tə(r), US 'faɪər-/ *noun*
(نافەرمی) ئاوراو، ئاوی ئاگرین ◌ آب آتشین
**fireweed** *noun*
گیائاگرە: جۆرێ گیا کە لە سووتاییدا زوو قوت دەبێتەوە، ب.ن. rosebay willowherb ◌ نوعی گیاه
**firewood** /'faɪəwʊd, US 'faɪərwʊd/ *noun*

ئاوردوو، ئێزنگ، هێزم، قەلاشکەری، ئەنجینە، هەزگەڵ، هەزگ‌وبزاڵ: *to collect/chop firewood* ◌ هیزم

**firework** /ˈfaɪəwɜːk, US ˈfaɪərwɜːrk/ *noun*
تۆق‌تۆقێن، ئاگرەخۆشە، گرمەمەشقەلان، گرگران، دەمەرقاچان، ماتاو، ئایرەکڵێ ◌ آتش‌بازی

**fireworks** /ˈfaɪəwɜːks, US ˈfaɪərwɜːrk/ *noun*
1 تۆق‌تۆقێن، ئاگرەخۆشە، ئاگربازی، ئایرەکڵێ، گرمەمەشقەلان، دەمەرقاچان 2 مشت‌ومڕ، جەنجالی ◌ 1 آتش‌بازی 2 مشاجره

**fire-worship** /ˈfaɪə wɜːʃɪp/ *noun*
ئاورپەرستی، ئاگرپەرستی ◌ آتش‌پرستی

**fire-worshipper** /ˈfaɪə wɜːʃɪpə(r)/ *noun*
ئاورپەرست، ئاگرپەرستی ◌ آتش‌پرست

**firing** /ˈfaɪərɪŋ/ *noun*
1 تەقاندن، تەقاندنەوە، گوللەخستن، تیرخستن: *There was continuous firing throughout the night* 2 کڵ، لە کڵنان، سوورکردنەوە 3 ناچارکردن بۆ بەجێهێشتنی کار: *teachers protesting against the firing of a colleague* ◌ 1 شلیک 2 پختن در کوره 3 فایرینگ

**firing-iron** /ˈfaɪərɪŋ aɪən/ *noun*
داخی ئاسن ◌ داغ آهن

**firing-line** /ˈfaɪərɪŋ laɪn/ *noun*
1 هێڵی ئاگر، هێڵی پێشەوەی بەرە (ی شەڕ): *attempts to prevent civilians from being in the firing line* 2 بارودۆخ یان ڕەوشێ کە کەسێ ئامانج و بابەتی ڕەخنەگری یان تانە و سەرکۆنەیە: *The employment secretary found himself in the firing line over recent job cuts* ◌ 1 خط آتش 2 در معرض انتقاد یا سرزنش قرار داشتن

**filing party** = filing squad

**filing squad** *noun*
دەستەی تیرەبارانکردن ◌ جوخەی آتش یا اعدام

**firm**[1] /fɜːm, US fɜːrm/ *adjective* (firmer, firmest), *adverb*
*adj* 1 پتەو، تۆکمە، قایم (نە زۆر و نە کەم)، جێگیر، بەهێز، سەخت، نەلەق، پێ‌بەجێ، سەقامگیر، چەقیو، ڕەق، توند، ڕۆنەچوو، دانەدەر 2 بەرشت، شێلگر، (لەسەر)سوور، بڕا، پتەو، بەبڕیار 3 یەکلایی‌کەرەوە، لێبڕاوانە 4 بەوەفا، بەئەمەگ، یەکلایی 5 پتەو، بەبیروباوەڕ، تۆکمە 6 لێ‌ڕابینراو، باوەڕپێکراو، بەڵگەنامەیی، جێ‌متمانە 7 تەواو، ڕەبەق 8 سەقامگیر، جێگیر (بارە، دراو و هتد) *adv* پتەو، تۆکمە، یەکلایی‌کەرەوانە، لێبڕاوانە ◌ *adj* 1 محکم، سفت، ناجنبان 2 جدی، مصمم 3 قطعی، قاطعانه 4 ثابت‌قدم 5 استوار، راسخ 6 موثق 7 تمام 8 ثابت *adv* محکم، قاطعانه

**firm**[2] /fɜːm, US fɜːrm/ *noun*
1 کۆمپانی، دەزگای کارداری یان بازرگانی 2 کۆمەڵی پزشکانی نەخۆشخانە ◌ 1 شرکت 2 تیم پزشکان بیمارستان

**firmament** /ˈfɜːməmənt, US ˈfɜːrm-/ *noun*
1 (ویژەیی) فەلەک، چەرخی فەلەک یا گەردوون، تاق یا گومەی ئاسمان، ئاسمان، گەردوون 2 پانتایی، بوار، مەڵبەند: *the international fashion firmament* 3 (بێ‌باو) basis = ◌ 1 گنبد مینا، آسمان 2 حوزه، گستره

**firmamental** /ˌfɜːməˈmentl, US ˌfɜːrˈm-/ *adjective*
ئاسمانی ◌ وابسته به آسمان

**firman** /ˈfɜːmən, fɜːˈmɑːn/ *noun*, also farman
فەرمان، دەستوور، فەرروار (بنەڕەت: لە "سانسکریتی" *pramāṇa*، بە واتای "ئەندازە، ستاندارد یان دەسەڵاتی ڕاست") ◌ فرمان

**firmly** /ˈfɜːmli, US ˈfɜːrm-/ *adverb*
پتەوانە، قایم، شێلگیرانە، لێبڕاوانە: *'I can manage,' she said firmly* ◌ به طور محکم، قاطعانه

**firmness** *noun*
1 ڕەقی، پتەوی، توندی، سەختی 2 تۆکمەیی، جێگیری، سەقامگیری، لێبڕاوی، بڕایی، شێلگیری ◌ 1 سفتی 2 استحکام، ثبات، قاطعیت

**firmware** /ˈfɜːmweə(r), US ˈfɜːrmwer/ *noun*
نەرمەواڵە یان نەرمویری جێگیر، فێرموێر، فێرموار (کۆمەڵە دەستوورێکی کارە بۆ کامپیوتێر کە لەسەر تەڵەزمە هەڵدەگیرێتەوە تا ئەوەی کە بە بەرنامە بێ) ◌ لخت‌افزار

**first** /fɜːst, US fɜːrst/ *ordinal number, adjective, adverb, pronoun, noun*
1 یەکەمین، هەوەڵین، سەرەتاترین، دەسپێک، یەکەم، هەوەڵ 2 لەپێشەوە، پێش‌تر، لە سەرەتادا 3 یەکەمین جار، بۆ هەوەڵین یان یەکەمین جار 4 پێش، بەری، لەوەپێش، لەپێش‌هەمووان، بەر لە گشت، بەر لە هەرشتێ 5 سەرەتا، دەسپێک، بەرایی، پێشەنگ، سەرکێش، سەرجەلە 6 (گێر) یەک 7 یەکەم کەس 8 پلەی یەک، نمرەی یەک (بریتانیا) ◌ 1 اولین، نخستین، اولیه، اول 2 مقدم، نخست این که 3 نخستین بار، برای اولین بار 4 بل، قبل از همه 5 آغاز، پیشتاز 6 یک (دنده) 7 نخستین نفر 8 رتبه‌ی اول (بریتانیا)

**first aid** *noun*
فریاکەوتنی سەرەتایی ◌ کمک‌های اولیه یا مقدماتی

**first aider** *noun*
فریاکەوتووی سەرەتایی ◌ کمک‌کننده‌ی اولیه

**first balcony** = dress circle

**first base** *noun*

یەکەم بەیس (لە یاری بەیسبۆڵدا) ◌ فرست بیس
**firstborn** /ˈfɜːstbɔːn, US ˈfɜːrstbɔːrn/ *noun, adjective*
(منال) گەورە، نۆبەرە، نخری، نۆزگە، نۆلەم، یەکەممنال، هەوەڵبوو: *their firstborn son* ◌ نخستزاده، ارشد

**first cause** *noun*
هۆی یەکەم ◌ علت‌العلل، علت نخست

**first class** *noun, adverb*
*n* 1 پلەی یەک، نمرەی یەکەم، نمرە یان پلەیەکی زۆرباش 2 باشترین یان گرانترین کورسی (فرۆکە، شەمەندەفەر و هتد) 3 پۆستی خێرا (بریتانیا) *adv* بە باشترین یان گرانترین کورسی (فرۆکە، شەمەندەفەر و هتد)، بە پۆستی خێرا ◌ *n* 1 مقام اول 2 درجه یک 3 پست سریع *adv* با درجه یک، با پست سریع

**first-class** *adjective*
هەرەباش، دەرەجەیەک، زۆرچاک ◌ عالی

**first command** *noun*
دەستووری سەرەتا، فەرمانی یەکەم ◌ امر اول

**first cost** = prime cost

**first cousin** *noun*
1 (ج کچ یان کور) ئامۆزا 2 خاڵۆزا 3 پوورزا، میمکزا ◌ 1 عموزاده 2 دایی‌زاده 3 عمه‌زاده، خاله‌زاده

**first creation** *noun*
ئافراندنی سەرەتا، یەکەم دروسکردن یان ئافراندن ◌ خلقت اول

**first degree** *adjective*
سووک، هەڵکڕووزان (سووتان، کوشتنکاری) ◌ خفیف

**first edition** *noun*
یەکەم چاپ، چاپی یەکەم ◌ چاپ اول

**first-ever** *adjective*
1 یەکەمین، هەوەڵین 2 بێ‌پێشینە: *his first-ever visit to London* ◌ 1 نخستین 2 بی‌سابقه

**first familiy** *noun*
یەکەم خێزان، خێزانی یەکەم (خێزانی سەرۆککۆماری ئەمریکا) ◌ خانواده‌ی نخست

**first finger** *noun*
دۆشاوەژە، قامکی نیشانە، پەنجەشارە ◌ انگشت سبابه

**first floor** *noun*
1 (لە بریتانیا) نهۆمی یەکەم یان سەرەوە 2 (لە ئەمریکا) نهۆمی ڕێکی عەرز ◌ 1 طبقه‌ی اول 2 طبقه‌ی همکف

**first-fruits** *noun, pl.*
1 بالاتە، نۆبەرە، تەروەندە، نوخشە، خیف، کەبار، تازەگەیشتوو 2 ئەنجامە سەرەتاییەکان، یەکەم ئاکامەکان ◌ 1 میوه‌ی نوبر 2 نتایج نخستین

**first gear** *noun*
گێر یان دەندە(ی) یەک (ماشین) ◌ دنده یک

**first generation** *noun*
یەکەم بەرە، نفشی سەرەتا، نەوەی هەوەڵ، وەچەی یەکەم ◌ نسل اول

**first half** *noun*
(وەرزش) نیوەی یەکەم، نیوەی هەوەڵ ◌ نیمه‌ی نخست

**firsthand** /fɜːsthænd/ *adjective, adverb*
*adj* مۆر، خۆتاقیکردوو، دەستی یەک، ڕاستەوخۆ، ڕەسەن *adv* لە دەستی یەکەوە، ڕاستەوخۆ (at first hand: ڕاستەوخۆ) ◌ *adj* دست اول، بلاواسطه *adv* از دست اول، بلاواسطه

**firsthand information** *noun*
زانیاری دەستی یەک یان ڕاستەوخۆ ◌ اطلاعات دست اول

**first heaven** *noun*
ئاسمانی یەکەم ◌ فلک اول

**first lady** *noun*
1 شاژن، ژنی سەرە، کەڵەژن (وەرزش، سەما یان پیشەیێ) 2 ژنی پێشەنگ ◌ 1 ملکه 2 زن پیشتاز

**the First Lady** *noun*
سەر(ۆک)ژن، خانمی یەکەم (ژنی سەرۆککۆمار یان هەرێمێک لە ستانداری ئەیالەتەکانی ئەمریکا) ◌ بانوی اول

**first language** *noun*
یەکەم زمان، زمانی دایکی، زمانی سەرەتا ◌ زبان اول یا مادری

**first lieutenant** *noun*
1 ئەفسەرێ لە ئەرتەش و هێزی دەریایی ئەمریکا خوارتر لە پلەی captain 2 ئەفسەرێ لە هێزی دەریایی بە پۆستی بەرپرسایەتی بەڕێوەبردنی کەشتیێ و هتد ◌ 1 ستوان یکم 2 ناوبان یکم

**first light** *noun*
شەبەق ◌ سحر، سپیده‌دم

**firstling** /fɜːstlɪŋ/ *noun*
(گیانەوەر یان بەرهەمی کشتوکاڵی) نۆبەرە ◌ فرستلینگ

**firstly** /ˈfɜːstli, US ˈfɜːrst-/ *adverb*
لە سەرەتا، یەکەمین، یەکەم ◌ در آغاز، نخست

**first mate** *noun*
ئەفسەرێ خوارتر لە پلەی captain لەسەر کەشتییەکی ئاسەربازی ◌ ناوبان یکم

**first name** *noun*
نێوی یەکەم، ناو، نێوی هەوەڵ ◌ اسم کوچک

**first nature** *noun*
یەکەم سروشت، خورسک یان سروشتی سەرەتا ◌ طبیعت اول

**first night** *noun*
شەوی کرانەوە یا یەکەم یا هەوەڵ (شانۆ،

کۆنسێرت و هتد): *I got tickets for the first night of 'Romeo and Juliet'* ◌ شب اول

**first off** *adverb*
لە سەرەتادا، یەکەمین ◌ اولاً

**first offender** *noun*
تاوانکاری یەکەمجار، تاوانکاری بێپێشینە، تازەتاوانکار، لەوەپێشنەکردوو ◌ مجرم بار اول، مجرم بدون سابقه

**first officer** = first mate

**first-past-the-post** *adjective*
(سیستمی هەڵبژاردن) کە لەودا تەنیا یەکەم کەس کە زۆرترین دەنگی بەدەس هێناوە، هەڵدەبژێردرێ ◌ نوعی سیستم انتخاباتی

**first person** *noun*
(ڕێزمان) یەکەم کەس ◌ اول شخص

**first principles** *noun. pl.*
بنەما سەرەتاییەکان ◌ اصول اولیه

**first-rate** /ˌfɜːst ˈreɪt/ *adjective, adverb*
هەرەباش، زۆرچاک، نمرەیەک، پلەی یەک: *The food here is absolutely -st-rate* ◌ عالی

**first reading** *noun*
خوێندنەوەی یەکەم ◌ قرائت اولیه

**first refusal** *noun*
مافی لەپێشتربوون ◌ حق تقدم

**first school** *noun*
(لە بریتانیا) خوێندنگای سەرەتایی، خوێندنگایێ بۆ منالانی تەمەن 5 تا 8 و 9 سالان ◌ دبستان، فرست سکول

**first sergeant** *noun*
(لە ئەرتەشی ئەمریکادا) بەرزترین پلەی نائەفسەریتی یەکەیێ ◌ استوار یکم

**first strike** *noun*
پارێز، هێرشی کتوپڕ (بەرلەوەی کە دوژمن دەس بکاتەوە، ب.ت. شەری ناوکی) ◌ حملەی غافلگیرانه

**first-string** *noun*
تیمێ کە یاریزانە سەرەکییەکانی تیایە ◌ مرکب از بازیکنان اصلی

**first thing** *noun*
بەیانی، هەوەڵی وەخت ◌ اول وقت

**first-time** *adjective*
جاری یەکەم، هەوەڵجار، یەکەمجار ◌ بار اول

**first-time buyer** *noun*
یەکەمجارکڕ، نۆکڕ، کڕیاری هەوەڵجار (خانوو یان دەستەخانوویێ) ◌ خریدار بار اول

**first-timer** *noun*
یەکەمجارکردوو ◌ انجامدهنده برای بار اول

**the First War** = the First World War

**First World** *noun*
وڵاتە پیشەسازە دەوڵەمەندەکانی جیهان، جیهانی یەکەم (وڵاتانی ڕۆژاوای ئەورووپا، ئەمریکا، ژاپۆن، ئەوسترالیا و نیوزیلەند) ◌ جهان اول

**the First World War** *noun*
شەڕی جیهانی یەکەم، جەنگی یەکەمی جیهانی ◌ جنگ جهانی اول

**firth** /fɜːθ, US fɜːrθ/ *noun,* also estuary
زمانەی دەریا، دەمی ڕووبار، ڕێژگەی ڕووبار ◌ مصب رودخانه

**fir-tree** *noun*
دار یان درەختی سنەوبەر ◌ درخت صنوبر

**fisc** /fɪsk/ *noun,* also fisk
(لە ڕۆمی کۆندا) خەزانە، خەزێنە ◌ خزانه

**fiscal** /ˈfɪskl/ *adjective*
1 دارایی، سەربە خەزێنەی حکومی یان میری، سەربە پارەی حکومی یان پارەی گشتی: *fiscal policies/reforms* 2 باجی ◌ 1 مالی 2 مالیاتی

**fiscally** /ˈfɪskli/ *adverb*
لەباری داراییەوە ◌ از نظر مالی

**fiscal year** = financial year

**fish** /fɪʃ/ *noun, pl.* same or fishes
1 ماسی، گۆشتی ماسی 2 مرۆ، بنیادەم ◌ 1 ماهی، گوشت ماهی 2 آدم

**fish and chips** *noun*
ماسی و پەتاتەی سوورەوەکراو (جۆرێ چێشت): *Three portions of fish and chips, please* ◌ ماهی و سیب‌زمینی سرخ کرده

**fishbowl** *noun*
جێماسی، شووشەماسی ◌ شیشەی ماهی

**fishcake** /ˈfɪʃkeɪk/ *noun,* also fish ball
کەیکی ماسی ◌ کیک ماهی

**fish duck** = merganser

**fish eagle** *noun*
هەڵۆی ماسیگرە یان ماسیخۆرە [ *Haliaeetus vocifer* (ئەفریکا) و جۆرەکانی تر] ◌ نوعی عقاب

**fisher** /ˈfɪʃə(r)/ *noun*
1 (گیانەوەرناسی) ماسیخۆرە، هێ دارستانەکانی ئەمریکای باکووری [*Martes pennanti*] 2 (کۆن) ماسیگر ◌ 1 صیاد 2 ماهی‌گیر

**fisher(boat)** /ˈfɪʃə(bəʊt)/ *noun*
قەفە یان گەمی ڕاوەماسی ◌ کَرَجی ماهی‌گیری

**fisherfolk** *noun, pl.*
(گەلی) ماسیگران، ماسیگیران، گەلی ڕاوچی ماسی ◌ ماهی‌گیران

**fisheries** *noun, sing.* fishery
ڕاوگەماسی ◌ شیلات

**fisherman** /ˈfɪʃəmən, US ˈfɪʃərmən/ *noun, pl.* fishermen
ماسیگر، ماسیگیر، ماسیەوان، تۆڕەوان ◌ ماهی‌گیر

**fisherman bat** = bulldog bat

**fisherman's knot** *noun*

گرێی ماسی‌گری یا ڕاوەماسی یان ماسی‌گیری ◌ گره ماهی‌گیری

**fisherman's rib** *noun*, also fisherman knit

جۆرێ چنینی ڕیزێی ئەستوور ◌ نوعی بافت

**fishery** /ˈfɪʃəri/ *noun*, *pl.* fisheries

1 ڕاوگەماسی (زۆرتر بە کۆ دێ)، جێگای ڕاوەماسی یان ماسی‌گیری 2 کارداری یان بازرگانی ڕاوەماسی، پیشەگەری یان ئینداستری ڕاوەماسی 3 مافی ڕاوەماسی 4 دەزگا یان دامەزراوەی ڕاوەماسی ◌ 1 (بیشتر در جمع) شیلات 2 صنعت صید ماهی 3 حق شیلات 4 مؤسسەی شیلات

**Fishes** *noun*

نەهەنگ (= دوازدەیەمین کەلوو لە زۆدیاک) ◌ حوت

**fish-eye** *noun*

1 هاوێنەی چاو(ە)ماسی 2 (لە ئەمریکا) ڕوانینی ناپاکانە یان بە گومانەوە ◌ 1 عدسی چشم‌ماهی 2 نگاه مظنون

**fish-eye-lens** /ˌfɪʃaɪ ˈlenz/ *noun*

هاوێنەی چاو(ە)ماسی ◌ عدسی چشم‌ماهی

**fish farm** /ˌfɪʃ fɑːm/ *noun*

شوێنی پەروەردە یان بەخێوکردنی ماسی، شوێنی ماسی‌ڕاگری ◌ محل پرورش ماهی

**fish farming** *noun*

ماسی‌ڕاگری، پەروەردە یا بەخێوکردنی ماسی، ماسی‌داری ◌ پرورش ماهی

**fish finger** *noun*

فیش‌فینگێر، بابۆڵەماسی ◌ ماهی لقمه

**fishful** *adjective*

پڕماسی ◌ پرماهی

**fish-globe** = fishbowl

**fish glue** = isinglass

**fish hawk** /ˌfɪʃ hɔːk/ = osprey

**fish-hook** /ˌfɪʃ hʊk/ *noun*

قەلانگ یان قولابی ڕاوەماسی، شەوک، قولابی ماسیگر ◌ قلاب ماهی‌گیری

**fishing** /ˈfɪʃɪŋ/ *noun*

ڕاوەماسی، ماسیگری، ماسی‌یەوانی (بۆ وەرزش یان کارداری): ◊ *They often go fishing* ◌ صید ماهی *deep-sea fishing*

**fishing fly** *noun*

مێشی ڕاوەماسی ◌ مگس ماهی‌گیری

**fishing ground** *noun*

شوێن یان ناوچەی ڕاوەماسی ◌ محل یا منطقەی ماهی‌گیری

**fishing harbour** *noun*

بەندەری ڕاوەماسی ◌ بندر ماهی‌گیری

**fishing-line** /ˈfɪʃɪŋ laɪn/ *noun*

بەت یان دەزووی ڕاوەماسی، پەتکی ڕاوەماسی ◌ نخ ماهی‌گیری

**fishing-net** /ˈfɪʃɪŋ net/ *noun*

تۆڕی ڕاوەماسی، لاگیرە ◌ تور ماهی‌گیری

**fishing-pole** = fhshing-rod

**fishing-rod** /ˈfɪʃɪŋ rɒd/ *noun*

داری ڕاوەماسی، خەمازە، شەوک، چوکلەقولاپ ◌ چوب ماهی‌گیری

**fishing tackle** *noun*

کەل‌وپەلی ڕاوەماسی، شت‌ومەکی ماسی‌گیری ◌ لوازم ماهی‌گیری

**fish-kettle** *noun*

دیزە یا قابلەمەی ماسی‌لێنان ◌ قابلمەی ماهی‌پزی

**fish-knife** *noun*

چەقۆ یا کاردی ماسی‌خۆری ◌ کارد ماهی‌خوری

**fish ladder** *noun*

پلیکانی ماسی ◌ پلکان ماهی

**fish louse** *noun*

کێچی ماسی (جۆرێ crustacean مشەخۆر، پێوەی دەنووسێ [زۆر جۆرن و لە پۆلەکانی Branchiura و Copepoda]) ◌ شپش ماهی

**fish manure** *noun*

پەیین(ـکـ)ی ماسی ◌ کود ماهی

**fish market** *noun*

بازاڕی ماسی‌فرۆشان ◌ بازار ماهی‌فروشان

**fishmeal** *noun*

گەردە یان ئاردەماسی ◌ پودر ماهی

**fishmonger** /ˈfɪʃmʌŋgə(r)/ *noun*

ماسی‌فرۆش ◌ ماهی‌فروش

**fish-net** /ˈfɪʃnet/ *noun*

1 خەراف، تۆڕی ڕاوەماسی 2 پارچە یان کوتاڵی تۆڕی، پارچەی تەنک ◌ 1 تور ماهی‌گیری 2 پارچەی توری

**fish-plate** /ˈfɪʃ pleɪt/ *noun*

بەست، پێکبەست، پشبەست (ڕێگای ئاسن) ◌ بست

**fish-poison** *noun*

مەرگەماسی، ژارماسی، دەرمانی ماسی ◌ فیش‌پویژن

**fish pole** = fishing-pole

**fish slice** /ˈfɪʃ slaɪs/ *noun*

کەوگیری لێنان، کەوچکی هەڵگێڕانەوە ◌ کف‌گیر ماهی‌پزی

**fish stick** = fish finger

**fish story** /ˈfɪʃ stɔːri/ *noun*

چیرۆک یان داستانی باوەڕپێنەکراو، چیرۆکی درۆ و دەلەسە ◌ داستان غیرقابل تصدیق

**fishtail** /ˈfɪʃteɪl/ *noun*

کلکەماسی (لە شێوە یان جووڵاندا لە کلکەماسی بچێ) ◌ دم‌ماهی

**fish-tank** *noun*

ماسی‌دان، ئاکواریۆم ◌ آکواریوم

**fish-trap** *noun*

ماشەڵ ◌ فیش‌تراپ

**fishwife** /ˈfɪʃwaɪf/ *noun, pl.* fishwives
1 ژنە ماسی‌فرۆش 2 پەتیارە، سەلیتە، بێ‌حەیا (ژن)، دەرپێ‌بەشان: *She cursed like a fishwife* ◌ 1 ماهی‌فروش (زن) 2 پتیارە

**fishy** /ˈfɪʃi/ *adjective* (fishier, fishiest)
1 ماسی‌ئاسا، پێوەندی بە ماسی‌یەوە هەیە (بۆن و بەرام)، پڕماسی 2 گومانـاوی، گومـان‌لەسەر، جێی‌شک (fishiness *n* ؛fishily *adv*) ◌ 1 ماهی‌مانند، وابستە بە ماهی، دارای ماهی بسیار 2 مشکوک

**fissile** /ˈfɪsaɪl, US ˈfɪsl/ *adjective*
1 لە داتلیشان‌هاتوو، لەکەرت(بوون)هاتوو (فیزیک): *fissile crystals* ◊ *fissile material* 2 دادەقلیشێ، دادەتلیشێ، لەشکان‌هاتوو، هەڵەقلیشێ، دەشکێ: *fissile wood* ◌ 1 شکافت‌پذیر 2 قابل شکستن

**fissility** /-ˈsɪlɪti/ *noun*
لە داتلیشان‌هاتوویی، لەکەرت(بوون)هاتوویی، لەداقلیشان‌هاتوویی ◌ شکافت‌پذیری

**fission** /ˈfɪʃn/ *noun*
1 (هەروەها nuclear fission) داتلیشان، داقلیشان، کەرت‌بوون (ناوکی گەردیلە nucleus of an atom) 2 کەرت‌بوونی خانەیی، دابەش‌بوونی خانەیی ◌ 1 شکافت 2 تقسیم یاختەای، انشقاق

**fissional** *adjective*
سەربە داتلیشان، داقلیشان یان کەرت‌بوون ◌ شکافتی، انشقاقی

**fissionable** *adjective*
لە داتلیشان‌هاتوو، داتلیشەنی، لەکەرت(بوون)هاتوو، لەدابەش(بوون)هاتوو (خانە) ◌ شکافت‌پذیر، تقسیم‌پذیر، انشقاق‌پذیر

**fission bomb** = atom bomb

**fissiparity** *noun*
زۆربوون یان زاوزێ بەرێگای کەرت‌بوونی خانە بیولۆژیکی‌یەکانەوە ◌ تولید مثل از راه تقسیم یاختەای

**fissiparous** *adjective*
زۆربوو یان زاوزێ‌کردوو بەرێگای کەرت‌بوونی خانە بیولۆژیکی‌یەکانەوە؛ divisive (fissiparousness *n*) ◌ فیسی‌پاروس

**fissiped** /ˈfɪsɪped/ *adjective, noun*
*adj* سم‌داقلیشاو، سم‌قلیشتە *n* گیانەوەری سم‌داقلیشاو ◌ *adj* سم‌شکافتە *n* جانور سم‌شکافتە

**fissure** /ˈfɪʃə(r)/ *noun*
1 (زەوی‌ناسی) جۆم، تلیش، کەندال، قلیش، درز: *parched grassland dissected by open fissures* 2 *dry* کەندال، قلیشە 3 قلیش، قەڵەشت 4 کێشە، دژایەتی، جیاوازی، ناتەبایی، ناسازی، منوتویی، کەلێن، کەلەبەر، دووبەرەکایەتی، دابەش‌بوون، schism: *fissures in a political party* ◌ 1 شکاف، چاک 2 درزە 3 شقاق، فیسور 4 اختلاف، شکاف؛ تقسیم

**fissured** *adjective*
قلیشاو، تلیشاو، درزبردوو، قلیش‌قلیش، شەق‌بردوو ◌ شکاف‌برداشتە

**fist** /fɪst/ *noun*
1 مشت، مست، دنگ 2 - 9 index (-fisted *adj*) ◌ مشت

**fistful** /ˈfɪstfʊl/ *noun, pl.* fistfuls
(پڕ)مشتێ، مستێ، ویچ، ویچی (لاویچ: نیومشت)، لاپە ◌ یک مشت

**fistic** *adjective*
سەربە شەڕەمشت ◌ وابستە بە مشت‌زنی

**fisticuffs** /ˈfɪstɪkʌfs/ *noun, pl.*
شەڕەمشت، مشت و مشتکاری ◌ مشت‌زنی

**fistula** /ˈfɪstjʊlə, US ˈfɪstʃələ/ *noun, pl.* fistulas or fistulae /-liː/
(پزشکی) ناسوور، ناسۆر، لوولە، بۆری، فیستول (ئینگلیسی نیوەڕاست، لە لاتین "fistula ،pipe ،flute") ◌ ناسور

**fistular** /ˈfɪstjʊlə(r), US ˈfɪstʃələ(r)/ *adjective*
ناسووری، ناسۆری، فیستۆلی ◌ ناسوری

**fistulous** /ˈfɪstjʊləs/ *adjective*
ناسووری، ناسۆری، فیستۆلی؛ بۆش وەک لوولە ◌ ناسوری

**fit**[1] /fɪt/ *adjective* (fitter, fittest)
1 باش، گونجاو، بەجێ، پێکەوتوو: *The food was not fit for human consumption* ◊ 2 *This is not a fit place for you to live* لێوەشاو، بەبەرزەوەند 3 ساغ، سلامەت 4 (بریتانیا و نافەرمی) سەرنج‌ڕاکێش (لەباری سێکسی‌یەوە) ◌ 1 درخور، مناسب 2 لایق، صلاح 3 سالم 4 جذاب (از لحاظ سکسی)

**fit**[2] /fɪt/ *noun*
1 لێهاتن، فێ، گەشکە (نەخۆشی) 2 بووڕانەوە، لەسەرخۆچوون، بێهۆشی 3 رق‌هەستاوی، تووڕەیی 4 لێهاتن، تەقینەوە، پێیران، خش‌بردنەوە، پێکەنینی بێ‌ئیختیار ◌ 1 حملە 2 غش 3 عصبانیت 4 ریسە

**fit**[3] /fɪt/ *noun*
ئەندازە، شتی ئەندازە ◌ اندازە، چیز متناسب

**fit**[4] /fɪt/ *noun,* also fytte
(کۆن) بەشێ لە هۆنراوە، برگە، کۆپلە ◌ بند

**fitch** = polecat

**fitchew** /ˈfɪtʃuː/ = polecat

**fitful** /ˈfɪtfl/ *adjective*
پچڕپچڕ، جارجار، جارناجار، تاوتاو، ناوەناوە، نارێک، نابەردەوام، لێهاتەیی، بگرەوبەردە، irregular ◌ بریدەبریدە، نامنظم، غیرمداوم

**fitfully** /'fɪtfəli/ *adverb*
پچڕپچڕانە، جارناجاری: *to sleep fitfully* ۞ بە طور نامنظم

**fitfulness** *noun*
1 لێهاتن 2 نارێکی ۞ 1 اسپاسم 2 بی‌نظمی

**fitly** *adverb*
لێوەشاوانە، گونجاوانە، بە شێوەیەکی گونجاو ۞ بە طور شایستە

**fitments** /'fɪtmənts/ *noun, pl.*
کەلوپەل، کەرەسە، شتومەک ۞ وسایل، اثاثیە

**fitness** /'fɪtnəs/ *noun*
1 گونجاوی، باشی، شیاوبوون، پێکەوتوویی: *a fitness ◊ high level of physical fitness a fitness instructor/class/test* 2 لێوەشاوەیی، لێهاتوویی 3 تەندروستی، لەش‌ساغی، سلامەتی، بەگوڕی، گوستاخی ۞ 1 مناسبت، برازندگی 2 صلاحیت 3 سلامت

**fitted** /'fɪtɪd/ *adjective*
1 گونجاو، لێوەشاو، پێکەوتوو 2 ئەندازە، پڕبەپێست، تەواو، پڕبەبەر، پڕ: *a fitted jacket ◊ kitchen/bedroom fitted ◊ wardrobes/cupboards* ۞ 1 شایستە، مناسب، دارای صلاحیت 2 جفت‌وجور

**fitter** /'fɪtə(r)/ *noun*
چەخماخ‌ساز، دەزگاوان، دەزگاساز، فیتیر، فیتەر، وەستاکار، دابەس‌کار: *a gas fitter* ۞ تعمیرکار، نصب‌کنندە

**fitting** /'fɪtɪŋ/ *adjective, noun*
*adj* گونجاو، لەبار، شیاو، باش، بەجێ: *A fitting end to the meal would be a glass of port* (fittings) *n* کەلوپەل، شتومەک، کەرەسە، ئەسپاب، شتومەکی نێومال ۞ *adj* شایستە، مناسب *n* وسایل، اسباب خانە

**fittingly** /'fɪtɪŋli/ *adverb*
گونجاوانە، بە شێوەیەکی گونجاو ۞ بە طور مناسب

**fitting room** *noun*
ژوور یان دیوی خۆگۆڕین ۞ رختکن

**fitting shop** *noun*
کارگەی بەستنەوە یان سوارکردن (دەزگاکان) ۞ کارگاه مونتاژ

**five** /faɪv/ cardinal number *adjective, noun*
*adj* پێنج (دانە) *n* 1 ژمارەی پێنج، ڕەنووسی پێنج 2 پێنج کەس ۞ *adj* پنج *n* 1 عدد پنج 2 پنج نفر

**five-alarm** *adjective*
1 (ئاورگرتن) یەکجار بەربلاو، زۆر گەورە، ماڵوێرانکەر 2 (چێشت و هتد) یەکجار تیژ ۞ 1 (آتش‌سوزی) خیلی جدی 2 (غذا و...) خیلی تند

**five-and-dime** *noun*, also five-and-dime store or five-and-ten
هەرزان‌فرۆشی پێنج و دەسێنتی (ب.ت. کەلوپەلی ناوماڵ، دووکان یان فرۆشگە) ۞ محل فروش وسایل ارزان‌قیمت

**five-and-ten** = five-and-dime

**five-a-side** *noun*
دەستەی 5 کەسە (فوتبۆڵی ئەمریکایی) ۞ تیم پنج‌نفرە

**fivefold** /'faɪvfəʊld, US -foʊld/ *adjective*
1 پێنج بەرامبەر، پێنج‌چەندان(ە)، پێنج ئەوندە 2 پێنج لۆ، پێنج قەد ۞ 1 پنج برابر 2 پنج لا

**five o'clock shadow** *noun*
بنەڕیش (لای ئێوارە) ۞ تەریش

**five pence** *noun*
پێنج پێنسی ۞ پنج پنی

**five penny** *noun*
پێنج پێنسی ۞ پنج پنی

**fiver** /'faɪvə(r)/ *noun*
پێنجی (دۆلار یان پەوند) ۞ پنجی

**fives** /faɪvz/ *noun, pl.*
پێنجە، پێنجان (یاری هەندبالی ئینگلتەرە) ۞ پنجە

**five-spot** *noun*
پێنج‌خاڵ (قاقەزی بە بایی 5 دۆلار) ۞ فایوسپوت

**five-star** *noun*
پێنج ئەستێرە: *a five-star hotel* ۞ پنج ستارە

**fivestones** *noun*
(لە بریتانیا) پێنج‌بەردێن، کاتیکانێ، پێنج‌سەنگێن (هەروەها بە کانزاش دەکرێ، زۆرتر بێ تۆپ) ۞ نوعی بازی

**fix** /fɪks/ *noun*
1 دابەستن، گیرکردن، چەسپاندن 2 سەرێشە، گێچەڵ، تەنگ‌وچەڵەمە، گرفتاری، گۆلەمەز، دەردەسەر 3 پەیداکردن یان دۆزینەوەی باروودۆخ، دیاریکردنی هەلومەرج (کەشتی، فڕۆکە و هتد)، ڕەوش، هەلومەرج، باروودۆخ 4 (هەلبژاردن) فرت‌وفێل، دەسکاری، گزەکاری 5 کردنەرەگ، دەرزی‌لێدان (تافەرمی، بەنگ) ۞ 1 کار گذاشتن، نصب 2 دردسر 3 تعیین موقعیت، وضعیت 4 (انتخابات) تقلب، زدوبند 5 تزریق

**fixable** /'fɪksəbl/ *adjective*
لەدابەستن‌هاتوو، پیادەچەسپێ، پێوەی گیر دەبێ ۞ نصب‌پذیر

**fixated** /fɪk'seɪtɪd/ *adjective*
لە بیری، سەرقاڵی، خەریکی ۞ در فکر

**fixation** /fɪk'seɪʃn/ *noun*
1 دلبەستەیی، دڵ‌تێچوون، خۆشەویستی زۆر، خولیا، کەلکەڵە: *a mother fixation* 2 چەسپاندن، ڕاگیرکردن، دابەستن، پێوەگیرکردن ۞ 1 دل‌مشغولی، دلبستگی 2 تثبیت، نصب

**fixative** /'fɪksətɪv/ *noun, adjective*
1 ماک یان دەرمانی چەسپاندن یان ڕاگیرکردن

(فیلمی ویتەیی و رەنگ)، ماکێ کە بۆ چەسپاندن، پاراستن یان جێگیرکردنی شتێ بەکاردێتریّ 2 چەسپێنەر 3 (ماکێ) کە لەو ڕێگاوە بەکاردێتریّ ◌ 1 مـادە یـا داروی ثبـوت 2 تثبیـت‌کننـده 3 (ماده‌ای) که از این طریق استفاده می‌شود

**fixed** /fɪkst/ *adjective*

1 چەسپیو، ڕاگیرکراو، نەگۆڕ، چەقبەستوو، داکوتراو، پتەو، پێ‌بەجێ، جێگیر، دیاری‌کراو، یەکلایی‌کراو، بڕاوە (نرخ) 2 دابەستراو، ڕاگیرکراو 3 لەسەرهۆش، بەسەرنج 4 دابین‌کراو، ئامادەکراو، تەیارکراو 5 جدی، وشک (پێکەنین و حالەتی سەروچاو)، بەرتیل‌پێدراو 6 چاوتێبڕیو ◌ 1 تثبیت‌شده، معین، مقطوع 2 نصب‌شده 3 متمرکز (حواس) 4 تهیه‌شده 5 جدی 6 تصنعی 7 رشوه داده‌شده 8 خیره

**fixed assets** *noun, pl.*

دارایی یان مالی جێگیر، دارایی نەگۆڕ، مردەدارایی، سامانی هەمیشەیی ◌ دارایی ثابت

**fixed capital** *noun*

سەرمایەی چەسپیو یان نەگۆڕ، مردەسەرمایە ◌ سرمایه‌ی ثابت

**fixed costs** *noun, pl.*

خەرج‌وباری جێگیر یان چەسپیو ◌ هزینه‌های ثابت

**fixed deposit** *noun*

ئەسپاردەی چەسپیو یان جێگیر ◌ سپرده‌ی ثابت

**fixedly** /ˈfɪksɪdli/ *adverb*

بە شێوەیەکی جێگیر، چەسپیوانە ◌ به طور ثابت

**fixed price** *noun*

نرخی بڕاوە یان نەگۆڕ، نرخی چەسپیو ◌ قیمت مقطوع

**fixed star** *noun*

ئەستێرەی جێگیر یان نەگۆڕ ◌ ستاره‌ی ثابت

**fixer** /ˈfɪksə(r)/ *noun*

1 دەرمانی چەسپاندن یا ڕاگیرکردن 2 کارڕێکخەر، دەلال، کارساز ◌ 1 داروی ثبوت 2 کارچاق‌کن

**fixing** /ˈfɪksɪŋ/ *noun*

دابەستن، گیرکردن، قایم‌کردن، چەسپاندن ◌ نصب، کارگذاری

**fixings** /ˈfɪksɪŋz/ = trimmings

**fixism** *noun*

جێگیری‌گەری، فیکسیزم، جێگیری‌خوازی ◌ ثبات‌گرایی

**fixist** *noun*

جێگیری‌گەر، جێگیری‌خواز ◌ ثبات‌گرا

**fixity** /ˈfɪksəti/ *noun*

چەسپیوی، سەقامگرتوویی، داکوتراوی، جێگیری، چەقبەستوویی، نەبزێوی، نەگۆڕی ◌ ثبات، استقرار، تغییرناپذیری

**fixity species** *noun, pl.*

جێگیری جۆر(ەک)ان ◌ ثبات انواع

**fixture** /ˈfɪkstʃə(r)/ *noun*

1 جێگیرکردن، چەسپاندن 2 (fixtures) کەلوپەلی جێگیری نێومال 3 ڕێکەوتی دیاری‌کراوی پێشبڕکێ 4 توخمی جێگیر یان هەمیشەیی، مرۆی هەمیشەداکوتاو، مرۆی چەقبەستوو یان تەکان‌نەخواردوو، بڕابەش ◌ 1 تثبیت 2 (در جمع) اثاثیه‌ی ثابت خانه 3 تاریخ معین مسابقه 4 عنصر دائمی یا ثابت، آدم سرقفلی

**fizgig** /ˈfɪzgɪg/ *noun*

1 (تافەرمی، ئەوسترالیا) سیخوڕی پۆلیس 2 (کۆن) جەوان یان لاوی زۆل و کەر ◌ 1 مخبر 2 جوان لاس‌زن یا احمق

**fizz** /fɪz/ *noun*

1 دەنگی فشە، دەنگی فسە یان فیزە 2 شامپانی 3 سەرخۆشی، بەکەیفی، شادی، دڵخۆشی ◌ 1 صدای فیس 2 شامپانی 3 نشاط

**fizzer** *noun*

تێشکان، شکست، سەرنەکەوتن ◌ شکست

**fizzle** /ˈfɪzl/ *noun*

1 تێشکان، سەرنەکەوتن 2 فیز، قرچە ◌ 1 شکست 2 فس

**fizzog** = phiz

**fizzy** /ˈfɪzi/ *adjective* (fizzier, fizziest)

1 هەڵچوو و گازدار، effervescent: *The wine was pink and slightly fizzy* 2 بەکەیف، بەدەماخ، exuberant ◌ 1 گازدار و جوشان 2 بانشاط

**fjord** /ˈfjɔːd, US ˈfjɔːrd/ *noun*, also fiord

دەریاکۆلان، شیواو، ئاودەرە، دۆلاو ب.ت. لە نۆروێژ ◌ آب‌دره

**fl** *abbreviation* floor

**Fla.** *abbreviation* Florida

**flab** /flæb/ *noun*

بەز (گۆشتی نەرم و شۆڕەوەبوو، وەکوو هی بەرخەبەبە) ◌ پیه

**flabbergasted** /ˈflæbəgɑːstɪd, US ˈflæbərgæstɪd/ *adjective*

دۆش‌داماو، دەمداچەقاندوو، تاساو، واق‌وڕماو، سەرسووڕماو ◌ مبهوت

**flabbiness** /ˈflæbinəs/ *noun*

بێ‌هێزی، خاوی، شلی، خۆنەگرتوویی، نەبەگەیی، شەویقی، پفەڵی، نەرمی، شۆڕی، داکەوتوویی ◌ ضعف، شلی

**flabby** /ˈflæbi/ *adjective* (flabbier, flabbiest)

1 شل، شل‌وشۆڕ، شەویق، پفەڵ، نەرم، نەبەگە، خۆنەگرتوو، شۆڕەوەبوو، داکەوتوو، flaccid: *He's got soft and flabby* ◊ *flabby thighs* 2 (کەسایەتی) *since he gave up running* سست، بەیدەس 3 زگزل، گمنە ( flabbily /ˈflæbɪli/ *adv*) ◌ 1 شل 2 ضعیف 3 شکم‌گنده

**flabellate** *adjective, also* flabelliform

(زینـدەوەرناسـی) بـاوەشـێنی، شـێوەبـاوەشـێن، باوەشێن‌ئاسا fan-shaped ◌ بادبزن‌نمای

**flabellum** *noun, pl.* flabella
1 باوەشێن، ب.ت. ئەوەی کە لە ڕێوڕەسمی دینی‌دا religious ceremonies بەکاردێتری 2 (زیندەوەرناسی) ئەندام یان بەشێکی باوەشێنی (بنەڕەت: لە لاتینەوە بە واتای "باوەشێن") ◌ 1 فلابلوم 2 (زیست‌شناسی) بادبزنه

**flaccid** /'flæsɪd, US 'flæk-/ *adjective*
1 شـل، شـەویق، پفـەڵ، خونـەگرتوو، نـەرم: 2 *flaccid breasts* ◊ *flaccid muscles* (پێست) چـرچ، گـنج‌تێکـەوتوو (*flaccidly adv*؛ *flaccidness n*) ◌ 1 شل، نرم 2 چروک‌شده

**flaccidity** /flæ'sɪdətɪ/ *noun*
شلی، شەویقی، پفەڵی، نەرمی، خونەگرتوویی، سستی، بێ‌هێزی ◌ شلی، نرمی، ضعف

**flack** /flæk/ = flak

**flag¹** /flæg/ *noun*
1 ئالا، درەوش، بەیداخ، پەندێر، بەندێر 2 ئالای کەشتی 3 نیشانەی بەتاڵبوونی تاکسی، تاکسی ئامادەی کرێکێشی 4 کلکی کاکێوی یان ئاسک ◌ 1 پرچم، علـم 2 پـرچم کـشتی 3 فـلاگ 4 دم گوزن

**flag²** /flæg/ *noun* = flagstone
بـەردی ڕێگـا، بـەردڕێژ، بـەردی تـەرک، تەختەبەرد، سەپتک، تاتەبەرد ◌ سنگ فرش

**flag³** /flæg/ *noun*
گولی زەمەق، زیو، زەمبەق، بە گەڵای درێژی شمشێرئاساوە [*Iris pseudacorus* (هی زەرد) و جۆرەکانی تر] ◌ گل زنبق

**flag boat** /flæg bəʊt/ *noun*
گەمی ئالادار یان نیشانەدار ◌ کرجی پرچم‌دار

**flag captain** /flæg kæptɪn/ *noun*
کەشتی‌یەوانی سەرکەشتی flagship ◌ کاپیتان ناو سرفرماندهی

**flag day** *noun*
1 ڕۆژی کۆکردنەوەی بارێو، ڕۆژی خرکردنەوەی یارمـەتی 2 (Flag Day) ڕۆژی ئـالا (ساڵوەگەری 14 ژوونی 1777 کە ئەستێرە و میلەکان بوونە ئالای نیشتمانی ئەمریکا) ◌ 1 روز جمع‌آوری اعانه 2 (Flag Day)روز پرچم

**flagella** = plural form of flegellum

**flagellant** /'flædʒ(ə)l(ə)nt, US flə'dʒɛl(ə)nt/ *noun*
شـێلاقلێـدەر، قـەمچی‌وەشـێن، جەڵـدەچی، جەڵدەلێدەر ◌ شلاق‌زن

**flagellar** *adjective*
شێلاقەیی، سەربە فلاجیلیۆم ◌ وابسته به تاژک

**Flagellata** *noun, pl.*
(گیانەوەرناسـی) قـەمچی‌داران، شـێلاق‌داران، شێلاق‌وەران ◌ تاژک‌داران

**flagellate** /'flædʒ(ə)leɪt/ *adjective*
(گیانەوەرناسی) شێلاق‌دار، شێلاق‌وەر ◌ تاژک‌دار

**flagellation** /ˌflædʒə'leɪʃn/ *noun*
شـێلاقلێـدان، قـەمچی‌پیاکێـشان (ب.ت. بـە مەبەستێکی دینی یان خۆشی نزیکایەتی) ◌ عمل تازیانه زدن، شلاق‌زنی

**flagellator** *noun*
شـێلاقلێـدەر، قـەمچی‌وەشـێن، جەڵـدەچی، جەڵدەپیاکێش ◌ تازیانه‌زن

**flagelliform** /ˌflæ'dʒələfɔːm/ *adjective*
شێلاق‌ئاسا، شێوە شێلاق، شێلاقی ◌ تازیانه‌مانند

**flagellum** /flə'dʒɛləm/ *noun, pl.* flagella
(گیانەوەرناسی) شێلاقە، فلاجیلیۆم ◌ تاژک

**flageolet¹** /ˌfladʒə'lɛt, 'fladʒəlɪt, 'fla(d)ʒəleɪ/ *noun*, also French flageolct
1 ئامێرێکی چکۆلەی فلوت‌ئاسا، چوار کون لە سەرێ و دوو کون بۆ قامکە کەڵـە لە خوارێ 2 – tin whistle ◌ نی‌لبک

**flageolet²** /'fla(d)ʒəleɪ, ˌfladʒə'lɛt/ *noun*
جۆرێ پاقلە یان لووبیای سووری فەرەنسی ◌ نوعی لوبیای قرمز

**flagged** /flægd/ *adjective*
بەردڕێژ (کراو) ◌ سنگ‌فرش‌شده

**flagginess** *noun*
سستی، لاوازی، بێ‌هێزی، کزی ◌ سستی، ضعف

**flagging** *adjective*
1 سـسـت، بـێ‌هێـز، کـز، لاواز، سیس، ژاکـاو، چـرچ‌هـەڵاتوو 2 کەمـەوەبوو 3 بـەردڕێژ ◌ 1 سست، ضعیف، پژمرده 2 کاهش‌یابنده 3 سنگ‌فرش

**flaggy** /'flægɪ/ *adjective* (flaggier, flaggiest)
1 قامیـشەڵان، چیتـەڵان، جگەنـەڵان 2 شـل، شەویق، پفەڵ، سـسـت، نەرم، شـۆڕ، شـۆڕەوەبوو، خونەگرتوو ◌ 1 نی‌زار 2 ول، آویخته

**flagitious** /flə'dʒɪʃəs/ *adjective*
1 خراپ، تاوانکار، بەدکار، ناحەز، بێ‌شەرمانە، ناشیرین، villainous 2 خراپانە، تاوانکارانە ◌ 1 تبهکار، شریر، وقیح 2 تبهکارانه

**flagitiously** /flə'dʒɪʃəsli/ *adverb*
خراپانە، تاوانکارانە ◌ تبهکارانه

**flagitiousness** /flə'dʒɪʃəsnəs/ *noun*
خراپی، تاوانکاری، بەدکاری، ناحەزی، بێ‌شەرمی، ناشیرینی ◌ تبهکاری، شرارت، وقاحت

**flagman** /'flægmən/ *noun. pl.* flagmen
ئالابەدەست، ئالاهەڵگر ◌ پرچم‌دار

**flag of convenience** *noun*
ئالای وڵاتێکی بیـانی لەسـەر کەشتی (بازرگانی merchant ship) وڵاتێکـی تـر، لەبـەر هـۆی قانوونی یان دارایی ◌ فلاگ اف کانوینس

**flag officer** *noun*
ئەفـسەری دەریایی، ئەدمیرال ◌ تیمسار

**flag of truce** *noun*

ئالای شەڕراگرتن ◌ پرچم متارکەی جنگ

**flagon** /'flægən/ *noun*

مەیخۆرک، مەیخۆری، تۆنگە مەی، تۆنگە، دەبە، کووپەمەی، کووپەبەرە؛ جێگە یان بوتڵێکی گەورە بۆ فرۆشتنی مەی یان سیدر کە 1.13 لیتر دەگرێ (دەوروبەری 2 پاینت pint) ◌ تنگ شراب، فلاگون

**flagpole** /'flægpəul, US -poul/ *noun*

داراڵا، میلی ئاڵا، دارەئاڵا ◌ میلەی پرچم

**flagrancy** /'fleɪgrənsɪ/ *noun*

ڕووڕەشی، ناحەزی، ناشیرینی، ناوزڕێنی، قەبەیی، هەرزەیی، بێشەرمی ◌ رسوایی، شناعت، وقاحت

**flagrant** /'fleɪgrənt/ *adjective*

بێشەرم، بێحەیا، ڕووڕەش، ناحەز، ناشیرین، ئابرووبەرە، ناوزڕێن، قەبە، هەرزە، بێشەرمانە، conspicuous: *a flagrant abuse of human rights* ◌ وقیح، زشت، شنیع، وقیحانه

**flagrantly** /'fleɪgrəntli/ *adverb*

بێشەرمانە، هەرزانە، بە ئاشکرایی، بێپەردە: *The plane flagrantly violated a UN no-fly zone* ◌ وقیحانه، بی‌پرده

**flagship** /'flægʃɪp/ *noun*

1 سەرکەشتی 2 هەڵبژاردە، سەرتۆپ، گرنگترین بەش، باشترین بەش 3 گرنگترین بەرهەمی کۆمپانیایێ ◌ 1 ناو سرفرماندهی 2 نخبه، مهم‌ترین قسمت 3 مهم‌ترین محصول شرکت

**flagstaff** /'flægstɑːf, US -stæf/ = flagpole

**flagstone** /'flægstəun, US -stoun/ *noun*, also flag2

بەردی ڕێگا، بەردڕێژ، بەردی تەرک، سەپتک، تاتەبەرد ◌ سنگ فرش

**flag-waving** *noun*

1 دەربڕینی دروشم و هەستوسۆزی نیشتمانی 2 پەرگیر، تونرەو ◌ 1 ابراز احساسات ملی 2 افراطی

**flail** /fleɪl/ *noun*

جەنجەڕ، موشان، گەلاکوتک، کلۆشار ◌ خرمن‌کوب

**flair** /fleə(r), US fler/ *noun*

1 توانایی، توانست، توانایی سروشتی، بەهرە، لێهاتوویی، توانایی لێککردنەوە، زیرەکی 2 ئارەزوو، حەز، مەیل، ویست ◌ 1 استعداد، قابلیت، قوەی تشخیص، فراست 2 میل

**flak** /flæk/ *noun*, also flack, *pl.* same

1 (گوللەخستنی) دژەفڕۆکە، چەکی فڕۆکەشکێن 2 ڕەخنەی توند (بنەڕەت: کورتەی ئەڵمانی *Fliegerabwehrkanone*) ◌ 1 ضد هوایی 2 انتقاد شدید

**flake**[1] /fleɪk/ *noun*

1 کلو، کولو، گولیچ، پشک، دەنک (بەفر) 2 توێژاڵ، توێ، گەرداڵ، تەلاشە، تەڵەزم، تیکە، توێخ، ناسکە، توێکڵ 3 پوولەکە 4 مرۆی شێت 5 کلۆلە خوری 6 (هەروەها flake tool) ئامێر یان کەرەسەیێکی سەردەمی بەردین (لە بەرد تاشراوە) 7 ((زمانی ڕەمەکی slang) = cocaine ◌ 1 دانه 2 ورقه، تکه 3 فلس 4 آدم دیوانه 5 گلوله‌ی پشم 6 و 7 فلیک

**flake**[2] /fleɪk/ = fake 2

**flake**[3] /fleɪk/ *noun*

1 شتێ بۆ هەڵگرتن و وشککردنەوەی خۆراک ب.ت. ماسی 2 پەنای لە دار یان دارین ◌ 1 فلیک 2 پناه چوبی

**flaked** *adjective*

توێتوێ(کراو)، گەرداڵگەرداڵ، توێخ‌توێخ، توێژاڵ‌توێژاڵ‌کراو ◌ ورقه‌ورقه‌شده

**flaking** *adjective*

توێتوێ، توێخ‌توێخ، توێژاڵ‌توێژاڵ، توێژاڵاوی ◌ پوسته‌پوسته

**flak jacket** *noun*

فەرمانەی دژەگوللە، سیخمە یا جلیسقەی دژەگوللە ◌ جلیقه‌ی ضد گلوله

**flaky** /'fleɪkɪ/ *adjective* (flakier, flakiest)

توێتوێ، توێخ‌توێخ، توێژاڵ‌توێژاڵ، توێژاڵاوی، توێتوێبوو، دەنک‌دەنک، کولوکولو: *a flaky snow crust*؛ گێژ، حۆل (flakiness /'fleɪkinəs/ n: توێتوێبوون، توێژاڵ‌توێژاڵ‌کراوی) ◌ ورقه‌ورقه، ورقه‌ورقه‌شونده؛ خنگ

**flam** *noun*

1 فێڵ، تەڵەکە 2 هارەوگێفە، خۆهەڵکێشان ◌ 1 حقه 2 لاف و گزاف

**flambeau** /'flæmbəu/ *noun*, *pl.* flambeaus or flambeaux /-əuz/

1 مەشخەڵ (ی چەندپلیتەیی)، torch 2 مۆمدانی لقولق ◌ 1 مشعل 2 شمعدانی چندشاخه

**flamboyance** /flæm'bɔɪəns/ *noun*

1 کڵپەکردن، درەوشانەوە 2 زریقەوبریقە، ئاڵاوواڵا 3 (خۆ)وانیشاندان، خۆنواندن ◌ 1 توهج، جلوه 2 زرق و برق 3 تظاهر

**flamboyant** /flæm'bɔɪənt/ *adjective, noun*

1 *adj* بەزریقەوبریقە، بەدەبدەبە، بەئاڵاوواڵا، بریقەدار، سەیروسەمەرە، درەوشاوە، زەق، ورشن، ڕەنگاوڕەنگ: *flamboyant clothes/designs* 2 خۆپیشاندەر، خۆنوێن، وانیشاندەرانە: *a flamboyant gesture/style/personality* 3 *n* دارەورشنە؟، جۆرێ دارێ ماداگاسکاری [*Delonix regia*] ◌ 1 *adj* پرجلوه 2 متظاهر، متظاهرانه *n* نوعی درخت

**flamboyantly** /flæm'bɔɪəntli/ *adverb*

بریقەدارانە، بە شێوەیەکی بریقەدار، بە ئاڵاوواڵاوە ◌ با زرق و برق

**flame** /fleɪm/ *noun*
1 گڕ، زمانە، بڵێسە، گوڕی، سوڵە، ئالاف، تڵە، لیسک، تێل، کڵپە: *the tiny yellow flame of a match* 2 درەوشانەوە، بریقەدانەوە، ڕۆشنایی، ڕووناکی، تیشک، تیرۆژ، شەوق 3 ڕەنگی شاد یان گەش، ڕەنگی ڕۆشن (ب.ت. سوور و نارنجی) 4 گڕاو 5 دڵداری، هەستی زۆر بەهێز، تین‌وتاو، گوڕ ۞ 1 شعله 2 درخشندگی، نور، پرتو 3 رنگ قرمز 4 معشوق 5 عشق، شور

**flame ionization** *noun*
(کیمیا) ئایۆنێنی گڕی ۞ یونش شعله‌ای

**flamen** /ˈfleɪmɛn, US ˈflɑː-/ *noun, pl.* flamens or flamines
(لە ڕۆمی کۆندا) قەشەی یەکێ لە خودایان ۞ کاهن یکی از خدایان

**flamenco** /fləˈmeŋkəʊ, US -koʊ/ *noun*
فلامینکۆ (جۆرێ سەمای سپانیایی و لە بنەڕەتدا هی دۆمەکانی ئەوێنەیە) ۞ فلامنکو

**flame photometry** *noun*
ڕووناکی‌پێوی گڕی، گڕەڕووناکی‌پێو ۞ نورسنجی شعله

**flameproof** /ˈfleɪmpruːf/ *adjective*
ئاورنەگر، دژەئاگر، نەسووت ۞ نسوز

**flame-thrower** *noun*
(سەربازی) گڕهاوێژ ۞ شعله‌افکن

**flame tree** *noun*
گڕەدار؟، بە گوڵی سووری بریقەدارەوە [*Brachychiton acerifolius* (ئەوسترالیا) و جۆرەکانی تر] ۞ نوعی درخت

**flaming** /ˈfleɪmɪŋ/ *adjective*
1 گڕکێشاو، گڕگرتوو، بڵێسەسەندوو، کڵپەکردوو 2 درەوشاوە، بریقەدار 3 سوور، ڕۆشن، گەش، نارنجی: *flaming (red) hair* 4 تونددوتیژ، ناورین 5 تووڕە، کفرەڕهاتوو: *a flaming argument/temper* ۞ 1 مشتعل 2 تابان 3 قرمز، نارنجی 4 خشن 5 عصبانی

**flamingo** /fləˈmɪŋgəʊ, US -goʊ/ *noun*, also flamingos or flamingoes
(گیانەوەرناسی) قورینگ، سوورەقورینگ، کەرنگ، قولینگ [خێزان Phoenicopteridae: چەندین جۆرن] ۞ فلامینگو

**flammability** /flæməˈbɪlɪtɪ/ *noun*
گڕکێشی، ئاگرگرتوویی، گڕالی، زووگرتوویی، لەگڕگرتن‌هاتویی، لەداگیرسان‌هاتوویی ۞ اشتعال‌پذیری

**flammable** /ˈflæməbl/ *adjective*
گڕکێش، ئاگرگرتوو، زووگرتوو، لەگڕگرتن‌هاتوو، لەداگیرسان‌هاتوو، گڕال، بە ئاسانی ئاور دەگرێ: *highly flammable liquids* ۞ اشتعال‌پذیر

**flan** /flæn/ *noun*
فلەن (= جۆرێ شیرینی پڕ لە پەنیر، هێلکە و میوە) ۞ فلن

**flâneur** /flaˈnəː, French flanœʀ/ *noun*
ڕێگارەو، قەدەم‌لێدەر، پیاسەکەر، پیاسەچی ۞ گردش‌کننده، پرسه‌زن

**flange** /flændʒ/ *noun*
1 باڵ، لا (کۆڵەکەی ئاسن) 2 (لوولە، پێچکە (ی شەمەندەفەر) باهوو، لا، لێواری دەرپەڕیو، دەور یان کەمەی دەرپەڕیو، لێوار: *a flange on a pipe* 3 سەر، نووک: *a flange on a wheel* ◊ (flangeless *adj*؛ flanged *adj*) ۞ 1 بال (تیرآهن) 2 اتصال لوله، لبه 2 کلاهک

**flank** /flæŋk/ *noun*
1 کەلەکە، خاڵیگە، پووتەگا، تەنیشت، بەرک، لاقەد، لاپاڵ، قەبرغە، نیفتەنگ (لەش) 2 گۆشتی کەلەکە، تەراف 3 لا، تەنیشت (خانوو) 4 (سەربازی) باڵ، قۆڵ، باسک: *right flank* "لای ڕاست، ڕاستەنگ"؛ *left flank* "لای چەپ، چەپەنگ"؛ بنەڕەت: لە *flanc* فەرەنسی کۆن، ئەڵمانی بنەڕەت) ۞ 1 پهلو 2 گوشت تهیگاه 3 ضلع، طرف 4 جناح

**flanked** *adjective*
لەتەنیشت‌جێگرتوو، لەلاهەڵکەوتوو، لاهەڵکەوتە، لابەند، تەنیشت‌بەند، لاپاڵ‌گیر ۞ کنار قرارگرفته

**flanker** /ˈflæŋkə(r)/ *noun*
1 یاریزانی هێرشبەر لە ڕاگبی یان فوتبۆڵی ئەمریکاییدا 2 دیوار و شوورەی تەنیشتی 3 (سەربازی، دەستەی) تەنیشت‌شکێن، لابڕ، تەنیشت‌بڕ، هەنگی لاشکێن ۞ فلانکر

**flannel**[1] /ˈflænl/ *noun*
1 فلانێل (پارچەیێ کە خوری و کەتانی تیایە و نەرمە) 2 بن‌کراسی فلانێل 3 لفکە، کیسە 4 (flannels) شاڵواری فلانێل (دروس‌کراو لە فلانێل، پیاوانە) ۞ 1 فلانل 2 زیرپوش فلانل 3 لیف 4 (در جمع) شلور فلانل

**flannel**[2] /ˈflænl/ *noun*
وەڵامی هەواڵە بە گەواڵە ۞ جواب سربالا

**flannelette** /ˌflænəˈlet/ *noun*
فلانێلێت (پارچەیێکی نەرمە بۆ جل‌وبەرگی خەو و کراسەکان بەکاردێنرێ) ۞ فلانلت

**flannelled** *adjective*, US also flanneled
شالواری فلانێل‌پۆشیو یان لەبەرکردوو ۞ شلوار فلانل پوشیده

**flap** /flæp/ *noun*
1 درگا، سەر، زمانە (گیرفان، بەرگ و هتد) 2 دەنگی شەقەشەق، شەق‌وکوت 3 فلەپ، پەردەباڵ، باڵۆچکەی زیادی جووڵۆک، باڵەجووڵە، شەقەباڵ، دەربیجەی باڵ (بەشێ لە باڵی فڕۆکە بۆ کۆنترۆڵی بەرز یان نەوی‌بوونەوەی بەکاردێ) 4 پەشۆکان، گێژی، سەرسامی، باری نیگەرانی، هەژان، وورووژان 5 (مێز، فڕۆکە) لا،

باڵ، بەشی هەڵواسراوی میز(ی قەدکراو) ◌ 1 در، لبه، زبانه 2 صدای تلپ‌تلپ 3 فلپ 4 دستپاچگی، گیجی، حالت اضطراب، هیجان 5 فلپ

**flapdoodle** /flæpdu:dl/ *noun*
1 (نافەرمی) قسەی هیچەکە، قسە قۆڕ، فلتە، یاوە، هەڵیت‌وپلیت 2 مرۆی گەوج ◌ 1 چرند، یاوه 2 آدم احمق

**flap-eared** *adjective*
گوێ‌شۆڕ ◌ آویخته‌گوش

**flapjack** /ˈflæpdʒæk/ *noun*
1 فلەپجەک (جۆرێ غورابی کەرە، هەنگوین، شیلە و پەرشت oats یێ تێدەکرێ) 2 پەنکەک (ئەستوور) ◌ 1 فلپ‌جک 2 پنکک

**flapper** /ˈflæpə(r)/ *noun*
1 مێشکوژ 2 بەچکەمراوی، بەچکەکەو 3 باڵی گەورە یان پان (ماسی) 4 درگا، سەر، بان، زمانە 5 ژنی هەرزە، جلف (لە بیستەکاندا) ◌ 1 مگس‌کش 2 جوجەی اردک یا کبک 3 بال پهن 4 در، زبانه 5 زن خلاف عرف

**flapper-bracket** *noun*
تەرکی زیادی (سەر دووچەرخە) ◌ ترک اضافی

**flare** /fleə(r), US fler/ *noun*
1 گڕ، بڵێسە، سۆڵە، پریشکە، گڵپە، گڕبە (وەک هی چۆڵەچرا) 2 رووناکی، شەوق، گەشانەوە، بریسکانەوە، روشنایی 3 چرا یان نیشانەی دەریایی 4 شەوق‌هاوێژ 5 پانەوەبوون، فش‌بوونەوە، چەترهەڵپێچان (داوێن) 6 تووڕەی لەناکاو 7 (سەربازی) فشفشە، رۆشنە 8 (flares) شەڵواری دەلینگ‌هەراو ◌ 1 شعله 2 روشنایی، نور 3 چراغ یا نشان دریایی 4 نورافکن 5 پهن‌شدگی 6 خشم ناگهانی 7 منور 8 (در جمع) شلوار پاچه‌گشاد

**flared** /fleəd, US flerd/ *adjective*
1 دەلینگ‌هەراو، دەلینگ‌فش: *a flared skirt* 2 چەترهەڵپێچاو، خۆفشەوەکردوو ◌ 1 پاچه‌گشاد 2 چتری

**flare-path** /ˈfleəpɑ:θ, US ˈflerpæθ/ *noun*
هێڵ یان باندی چرادار، باندی رووناک، باندی چراڕێژ، هێڵی رۆشن (بۆ نیشتنەوە یان هەستانی فڕۆکە) ◌ باند منور

**flare-up** *noun*
1 زمانە، گڕ، سۆڵە، گڕبە، گڕگرتن، هەڵبوون، داگیرسان: *a flare-up of the bushfires* 2 تووڕەبوونی کتوپڕ، لە دین‌دەرچوون، هەڵچوون، وورووژان، هەڵبوون، تەقینەوە: *a flare-up of tension between the two sides* 3 (نەخۆشی) (سەر)هەڵدانەوە، لێهاتنەوە 4 (شەڕ و هتد) دەس‌پێکردن ◌ 1 شعله، اشتعال 2 خشم ناگهانی، غلیان، انفجار 3 عود 4 شروع

**flaring** *adjective*
1 گڕگرتوو، داگیرساو، هەڵگیرساو، رووناک 2 گڕبەگڕ، گڕپاوی ◌ 1 مشتعل 2 کورکوری

**flash** /flæʃ/ *noun, adjective,* news flash
*n* 1 رووناکایی، درەوشانەوە، رۆشنایی، شەوق، بریسکانەوە، ورشانەوە، بریقانەوە، پرشنگ 2 پریشکە، بریسکە، بریقە، ترووسکە، چەخماخە 3 تاو، چرکەسات 4 (وێنەگری) فلەش، برووسکە، بریسکە 5 چراقەوە 6 نیشانە، بەرژەنگ 7 (سەربازی) سەرقۆڵ، سەرشان 8 خۆدەرخستن (کەمێ) بەزریقەوبریقە *adj* ◌ *n* 1 درخشش 2 جرقه، بارقه 3 آن 4 فلاش 5 چراغ‌قوه 6 علامت 7 سردوشی 8 تن‌نمایی *adj* زرق‌وبرق‌دار

**flashback** /ˈflæʃbæk/ *noun*
1 گەڕانەوە بۆ رابردوو، بۆ دواوە گەڕانەوە، پاش‌گەڕانەوە، دیمەنی بۆ پاشەوەچوو، پاش‌چوونەوە (فیلم، شانۆ، چیرۆک و هتد) 2 بیرهاتنەوەی بیرەوەرییێ ◌ 1 پس‌نگاه 2 فلاش‌بک

**flashbulb** /ˈflæʃbʌlb/ *noun,* also flash lamp
گڵۆپی فلەش، برووسکەچرا، فلەش‌گڵۆپ ◌ لامپ فلاش

**flash burn** *noun*
سووتانی لەبەر تەقینەوە (تەقینەوە و هالاوی گەردیلەیی یان ئەتۆمی) ◌ سوختگی ناشی از انفجار

**flashcard** /ˈflæʃkɑ:d, US -kɑ:rd/ *noun*
کارتی پیشان‌دان ◌ فلاش‌کارت

**flash drive** *noun,* USB drive , pen drive, US thumb drive
(کامپیوتێر) فلاش درایڤ (هەروەها memory stick) شتێ کە دەتوانرێ زانیاری و شتی وای تیاهەڵبگیرێتەوە: *The flash drive is compatible with all notebook PCs running Windows* ◌ فلاش درایو

**flasher** /ˈflæʃə(r)/ *noun*
1 چرای رێ‌نیشان‌دان (یان راکێشانی سەرنج) 2 (مرۆی) خۆدەرخەر exhibitionist ◌ 1 چراغ راهنما 2 (آدم) تن‌نما

**flash-flood** *noun*
لافاوی کتوپڕ، سێلاوی لەپڕ ◌ سیل ناگهانی

**flash-forward** *noun*
پێش‌داچوون، پێش‌چوونەوە، چوون بۆ داهاتوو، پێش‌چوون ◌ پیش‌نگاه

**flashgun** /ˈflæʃgʌn/ *noun*
(وێنەگری) بریسکە یان فلاشی ئۆتۆماتیک ◌ فلاش خودکار

**flashily** /ˈflæʃɪli/ *adverb*
1 خۆدەرخەرانە 2 بە زریقەوبریقە: *flashily dressed* ◌ 1 تن‌نمایانه 2 با زرق و برق

**flashiness** /ˈflæʃinəs/ *noun*
خۆدەرخستن، خۆپیشان‌دان ◌ تن‌نمایی

**flashing** /ˈflæʃɪŋ/ *noun*

قەڵەش‌گر، قەڵەش‌بەست، قەڵەش‌پۆش، درزگر، درزبەست ◌ درزپوش

**flashing light** *noun*

چـرای برووسـکەدەر، چرابرووسـکە، شـەوقە تروووکە، رۆشنایی یان رووناکی بروسکەدەر ◌ نور چشمک‌زن

**flashlight** /'flæʃlaɪt/ *noun*

1 (وێنـەگری) بروسـکە، بریسـکە، روونـاکی 2 چراقەوە، چۆڵەچرا 3 چرابرووسکە 4 flashgun ◌ 1 فلاش 2 چراغ‌قوه 3 چراغ چشمک‌زن

**flash memory** *noun*

(کامپیوتێر) فلەش مێمۆری ◌ فلاش مموری

**flashover** *noun*

هەورەتریشقە، تریشقە، بروسکە ◌ صاعقه، برق

**flashpoint** /'flæʃpɔɪnt/ *noun*

1 خاڵـی گرکێشان یـان گرگرتن یـان گریان 2 خاڵـی تەقینـەوە ◌ 1 نقطـەی اشـتعال 2 نقطـەی انفجار

**flashy** /'flæʃi/ *adjective* (flashier, flashiest)

بەزرێقەوبریقـە، بریقـەدار: *a flashy hotel* (flashiness *n*) ◌ پرزرق و برق

**flask** /flɑːsk, US flæsk/ *noun*

1 شووشـەی تاقیگـە 2 کەمۆڵـە، سـاردوگەرم، فلاسـک 3 شووشـە ◌ 1 بـالون (آزمایـشگاه) 2 فلاسـک 3 بطری

**flat**[1] /flæt/ *noun*

(ب.ت. لـە ئـەمریکا) دەسـتەخانوو، دەسـتەدیو، باڵاخانە ◌ آپارتمان

**flat**[2] /flæt/ *adjective, adverb*

*adj* 1 تـەخت، رێـک، گـۆڕ، راسـت، پـان 2 وەڕەسـکەر، نـاخۆش، عاجزکـەر، شـەکەتکەر 3 (راوێژ) سـارد 4 بێ‌بازاڕی، بێ‌بڕەو، خـەوتوو، کەساد 5 دەمەوروو، لەسەرزگ 6 (نرخ) نەگۆڕ، دیـاریکـراو، چەسـپیو، براوەتـەوە، جـێگیر 7 وەڕەس، نارەحـەت، جـاڕز 8 بـەتاڵ، خاڵـی (پـاتری) 9 پەنچـەر، کـەمبا، بـێبا، کـون 10 بێ‌کەف، بێ‌گاز 11 (بنی پێ) تەخت، رێک 12 (موسیقا) نزمۆک 13 مات، نەدرەوشاوە، تاریک (رەنـگ) 14 (وێنەکێـشی) تـەخت 15 رێک‌وراست، رەپ‌وراست 16 (کەوش) تەخت، بـێپاژنـە (یـان بـەرز نـەبێ) *adv* بەتـەواوەتی، سـەرپاکی ◌ *adj* 1 صاف، هموار 2 کسل‌کننده 3 بی‌احساس (لحن) 4 کساد 5 دمر 6 ثابت 7 دمغ 8 خالی (باتری) 9 پنجر 10 بدون گاز 11 بدون قوس پا 12 (موسیقی) بمُل 13 مات 14 (نقاشی) بی‌عمق 15 صاف و پوست‌کنده 16 بدون پاشنه *adv* کاملاً

**flat**[3] /flæt/ *noun*

1 ● (نافـەرمی) تایـەی پەنچـەر 2 راسـتەزەوی، دەشت، زەوی تەخت و گـۆڕ، گـۆڕایی، راسـتایی 3 نـۆتی نزمـۆک؛ نیشانەی نزمـۆک 4 (شمشێر) پانـایی، شـیپە 5 (flats) زەوی نـزم 6 کەوشـی بێ‌پاژنە یان پاژنەنزم، پێڵاوی تـەخت 7 (the flat racing = Flat) ◌ 1 لاستیک پنچر 2 زمین هموار 3 نت بمُل؛ علامت بمل 4 پهنـا (شمـشیر) 5 (در جمع) زمین پست 6 کفش تخت

**flatbed** /'flætbed/ *noun*, also flatbed trailer or flatbed truck

تریلی دیوارنزم یان بێ‌لاجامە، تریلی سەرئاواڵە، بارکێشی تەخت ◌ تریلی روباز، تریلی مسطح

**flat-bottomed** *adjective*, also flat-boat

بن‌رێک، بن‌تەخت (گەمی) ◌ تەصاف

**flatbread** *noun*

جـۆرێ نـانی ناسـک و تـەخت و زۆرتـر هەڵنەهاتوو ◌ نوعی نان

**flat broke** *adjective*

لەسـەر ساجی عـەلی، هـیچ شـکنـەبردوو، لاتی لات، سوختی ◌ مفلس

**flat cap** = cloth cap

**flatcar** /'flætkɑː(r)/ *noun*

واگۆنی باری تەخت یان بێ‌دیوار (بێ‌باخەڵ) ◌ واگن باری مسطح

**flat-chested** *adjective*

مـەمک‌تـەخت، بـێمـەمک، سـنگ‌پـووچ، مەمک‌چکۆلە ◌ پستان‌کوچک

**flatfish** /'flætfɪʃ/ *noun, pl.* same or flatfishes

ماسی پان، پانەماسی، ماسی‌پەپانە، ماسی‌پانکە (بـۆ نموونـە plaice و sole) [دەسـتە Pleuronectiformes] ◌ ماهی پهن

**flatfoot** *noun, pl.* flatfoots or flatfeet

(نافەرمی) پۆلیس، پاسەبان ◌ پاسبان

**flatfooted** /ˌflæt'fʊtɪd/ *adjective*

1 تـەخت، رێـک 2 دەسـتەوسـان، بـێدەس، بەیدەس، ناشی: *They were caught flat-footed by the attack* ◌ 1 صـاف 2 دست‌وپاچلفتی

**flatfootedly** /ˌflæt'fʊtɪdli/ *adverb*

1 تەختانە، رێکانە 2 بە شێوەیێکی دەستەوسان، بەیدەسانە ◌ 1 بـە طـور صـاف 2 بـە طـور دست‌وپاچلفتی

**flatfootedness** *noun*

1 تـەختی، رێکـی 2 دەسـتەوسـانی، بـێدەسـی، بەیدەسـی، ناشـیگـەری ◌ 1 صـافی 2 دست‌وپاچلفتی بودن

**Flathead** *noun*

1 ئەنـدامی هێنـدێ لـە گـەلانی سووریپـستی ئـەمریکای بـاکووری 2 گـەلێکـی سووریپـستی مۆنتانا 3 Montana (flathead) ماسی‌پەسەرپانە [خێزانی Platycephalidae: چەندین جۆرن] 4 (fleathead، وەک ئاوەڵناو) ئاماژە بەو بزوێنە کە لە جیاتی سـەرسیلیندر، زمانە و مۆمەکانی spark plug لەنێو لاشەی مۆتۆردا هەیە ◌ 1 و

2 و 4 فلات‌هد 3 نوعی ماهی

**flathead catfish** *noun*
نقە یا باقو یا پشیلەماسی‌یە سەرپانە [ *Polydictis olivaris*] ◌ نوعی ماهی

**flatiron** /ˈflætaɪən/ *noun*
وتو، ئوتو، ناوەشکێنە (بە خەڵووز یان ئاور کار دەکا) ◌ اتو

**flatlet** /ˈflætlət/ *noun*
دەستەخانووی چکۆلانە ◌ آپارتمان کوچک

**flatly** /ˈflætli/ *adverb*
بە شێوەیەکی تەخت، ڕێکانە ◌ بە طور هموار

**flatmate** /ˈflætmeɪt/ *noun*
هاومال، هاوخانوو، ئاوەڵمال، هاوژوور، هاودیو ◌ هم‌خانە، هم‌اتاقی

**flat racing** *noun*
وەرزش یان پێشبرکێی ئەسپ‌سواری بێ‌کۆسپ، وەرزش یا پێشبرکێی ئەسپ‌سواری لە تەختایی‌دا ◌ ورزش یا مسابقەی اسب‌دوانی بدون مانع

**flat rate** *noun*
نرخی نەگۆڕ، نرخی چەسپیو، بایی جێگیر: *Interest is charged at a flat rate of 11%* ◌ قیمت ثابت

**flat spin** *noun*, be in a flat spin
پەشۆکاوی، سەرسامان، (سەر)لێ‌شێوان ◌ سراسیمگی، آشفتگی

**flattened** *adjective*
تەخت، ڕێک، گوڕ، پان ◌ صاف، پهن

**flattered** *adjective*
ڕازی، پێخۆش‌بوو، قایل، خۆشحاڵ، بەکەیف ◌ خرسند، مسرور

**flatterer** /ˈflætərə(r)/ *noun*
نەرمەبڕ، ڕووپاما، ڕیایی‌باز، زمانلووس، زمانچەور ◌ چاپلوس

**flattering** /ˈflætərɪŋ/ *adjective*
1 خۆش‌دیمەن، جوان: ◊ *a flattering dress*
2 سەرنج‌ڕاکێش، خۆش، زمانلووسانە: *The photo is not very flattering* *flattering remarks* ◌ 1 پرجلوه 2 خوشایند، تملق‌آمیز

**flatteringly** /ˈflætərɪŋli/ *adverb*
زمانلووسانە، زمانچەورانە ◌ چاپلوسانه

**flattery** /ˈflætəri/ *noun*, *pl.* flatteris
ڕووپامایی، ڕیایی‌بازی، ڕواڵەت، زمانلووسی، نەرمەبڕی، کلکەسووتێ: *You're too intelligent to fall for his flattery* ◌ تملق، چاپلوسی

**flatties** /ˈflætiz/ *noun*, *pl.*
1 کەوشی تەخت، کەوشی بێ‌پاژنە یان پاژنە(زۆر)نزم 2 (نافەرمی) ئەفسەری پۆلیس 3 ماسی‌یەپانە 4 جۆری شێوازی قژە 5 = flat-boat ◌ 1 کفش تخت 2 پلیس 3 ماهی پهن 4 نوعی مدل مو

**flattop** *noun*
1 (ئەمریکا و نافەرمی) فڕۆکەهەڵگر (کەشتی) 2 جۆری گیتاری دەنگی، پێشەوەی پانە تا چەماوە بێ ◌ 1 هواپیمابر 2 نوعی گیتار

**flatulence** /ˈflætjʊləns, US -tʃə-/ *noun*, also flatuosity
1 باوێنج، باوێژ، بای زگ: *Symptoms may also include flatulence and nausea* 2 خۆبەزلزانی، ترووتوپ، باوفش ◌ 1 باد شکم 2 تکبر

**flatulent** /ˈflætjʊlənt, US -tʃə-/ *adjective*, also flatuous
1 بەباوێنج، باکردوو، ترن، ترکەن، چووکن، تسکن 2 بەترووتوپانە، خۆپیشان‌دەرانە ◌ 1 نفاخ 2 متکبرانه

**flatulently** /ˈflætjʊləntli, US -tʃə-/ *adverb*
بەترووتوپانە، خۆپیشان‌دەرانە ◌ متکبرانه

**flatus** /ˈfleɪtəs/ *noun*
باوێنج، باوێژ، با یان گازی زگ ◌ باد شکم

**flatware** ˈflætweə(r)/ = cutlery

**flatworm** *noun*
پانەکرم، کرمەپان [لق Platyhelminthes] ◌ نوعی کرم

**flat yield** *noun*
(ئابووری) ئەنجام‌دانەوەی جێگیر، کاردانەوەی نەگۆڕ ◌ بازده یکنواخت

**flaunting** *noun*
خۆنواندن، خۆپیشان‌دان، خۆهەڵکێشان ◌ تظاهر، خودنمایی

**flauntingly** *adverb*
خۆنیشان‌دەرانە ◌ متظاهرانه

**flautist** /ˈflɔːtɪst, US ˈflaʊtɪst/ *noun*
فلووت‌ژەن ◌ نوازندەی فلوت

**flavanone** *noun*
فلاڤانۆن: هەریەک لە کێتۆنە ئارۆماتیکە جۆراوجۆرەکان کە زۆرتر لە ڕووەکدا وەک glycoside ـەکاندا هەن و ژێرکۆمەڵەیێکی flavonoid پێکدێنن ◌ فلاوانون

**flavescent** /fləˈvɛs(ə)nt/ *adjective*
1 مەیلەوبەزەرد، زەردباو 2 زەردەوەبوو ◌ 1 متمایل به زرد 2 زردشونده

**Flavian** /ˈfleɪvɪən/ *adjective, noun*
*adj* سەربە بەرەیێکی ئیمپراتۆرەکانی ڕۆم (69-96) پاش‌زایین *n* ئەندامی ئەو بەرەیە (لە *Flavianus* لاتین، لە *Flavius* ناوێکی تایبەتی کە لە لایەن ئەم بەرەیەوە بەکار دێترا) ◌ فلاوین

**flavin** /ˈfleɪvɪn/ *noun*
(کیمیا) فلاڤین، زەردین(ە): کۆمەڵێ لە ڕەنگیان پێگمێنتە نایترۆژێن‌دارەکان، وەک riboflavin کە وەک coenzyme ـەکان کار دەکەن (بنەڕەت: لە *flavus* لاتین "زەرد" + -

in[1]) ◇ فلاوین

**flavin adenine dinucleotide** *noun*
فلاڤین ئادینین داینوکلیۆتید: دواهەوێنەی flavoprotein ـە هێنەندی لە $C_{27}H_{33}N_9O_{15}P_2$ ـەکان ◇ فلاوین ادنین دینوکلیوتید

**flavin mononucleotide** = FMN

**flavone** /ˈfleɪvəʊn/ *noun*
(کیمیا) زەردۆن، فلاڤۆن، ئاوێتەیێکی ئەندامی بلووری بێ‌ڕەنگ، کە بنچینەی ژمارەیێ ڕەنگی ڕووەکی زەرد و سپی‌یە ◇ فلاوون

**flavonoid** *noun*
فلاڤۆنۆید: ئەو گرووپە ئاوێتە ئانتی‌ئۆکسیدانە ئارۆماتیکانەی کە ئۆکسیژێنان تیایە و زۆر پیگمێنتی ئاسایی دەگرنەوە (وەک anthocyanin و flavon ـەکان) ◇ فلاوونوید

**flavoprotein** /ˌfleɪvə(ʊ)ˈprəʊtiːn/ *noun*, also yellow enzyme
(زیندەکیمیا) فلاڤۆپرۆتین: dehydrogenase ێ کە فلاڤین و پتر کانزایێکی تیایە و ڕۆڵێکی گەورە لە ئۆکسان oxidation زیندەناسی‌یانە biological دەگێڕێ، دەستەیێ لە پرۆتینەکان کە فلاڤینەکان دەگرێتەوە و بەشداری کاردانەوەی ئۆکسانی خانەکان دەکا (تێکەڵی flavin + protein) ◇ فلاوپروتین

**flavour** /ˈfleɪvə(r)/ *noun*, US flavor
1 تام، چێژ، مەزە: The tomatoes give extra flavour to the sauce 2 بەهارات، کاری، هەزوێلە 3 کەش، تایبەتمەندی، تام‌وبۆ، سەنگ‌وڕەنگ، ڕەنگ‌وبۆ، ambience: the distinctive flavour of South Florida ◇ 1 طعم، مزه 2 چاشنی 3 جو، ویژگی

**flavoured** /ˈfleɪvəd, US -vərd/ *adjective*
(لە لێکدانا) بە تامی، بە چێژی ◇ دارای طعم

**flavourful** /ˈfleɪvəfʊl, US -vərf-/ = flavoursome

**flavouring** /ˈfleɪvərɪŋ/ *noun*, US flavoring
بەهارات، کاری، هەزوێلە، بۆن(یا تام)خۆشکەر: orange/vanilla flavouring ◊ This food contains no artificial flavourings ◇ چاشنی، طعم‌افزا

**flavourless** /ˈfleɪvələs, US -ərləs/ *adjective*
بێ‌تام، بێ‌چێژ، بێ‌مەزە، بێ‌لەزەت، تامسار: The meat was tough and flavourless ◇ بی‌مزه

**flavoursome** /ˈfleɪvəsəm, US -vərs-/ *adjective*
بەچێژ، خۆش، تام‌خۆش، بەمەزە، بەلەزەت: a wine with a light, -me aroma ◇ خوشمزه

**flaw**[1] /flɔː/ *noun*
1 ناتەواوی، عەیب، خەوش: a diamond with a flaw 2 (شووشە، چینکۆ و هتد) موو، چرژ، چرژاوی، قەڵەشتوی، درز 3 خاڵی لاوازی، کەم‌وکووڕی، ناتەواوی، شکستی، عەیب، ئیراد 4 هەڵە، لێ‌هەڵقلیشان، خەتا 5 (بێ‌باو) fragment ◇ 1 نقص 2 ترک 3 نقطه‌ضعف 4 خطا

**flaw**[2] /flɔː/ *noun*
(وێژەیی) تۆف‌وبەند، با و بۆران، با و باران، ڕەشەبای کورت، بای کوت‌وپڕ ◇ باد وباران، توفان ناگهانی

**flawed** /flɔːd/ *adjective*
1 ناتەواو، نیوەچڵ، عەیب‌دار، خەوش‌دار، بەگەرد: the book's flawed heroine ◊ a flawed argument 2 هەڵە، شاش ◇ 1 ناقص، معیوب 2 اشتباه

**flawless** /ˈflɔːləs/ *adjective*
بێ‌خەوش، بێ‌گەرد، بێ‌عەیب، تەواو، perfect: Her English is almost flawless ◊ a flawless complexion/performance ◇ بی‌نقص، بدون عیب

**flawlessly** /ˈflɔːləsli/ *adverb*
بێ‌خەوشانە، بێ‌گەردانە ◇ به طور بی‌نقص

**flawlessness** /ˈflɔːləsnəs/ *noun*
بێ‌خەوشی، بێ‌گەردی، تەواوی، بێ‌عەیبی ◇ بی‌نقصی، کمال

**flawy** /ˈflɔːɪ/ *adjective*
1 عەیب‌دار، پڕخەوش 2 درزاوی، چرژاو، چرچرژ، درزبردوو ◇ 1 معیوب 2 ترک‌دار

**flax** /flæks/ *noun*
1 (ڕووەک‌ناسی) گوش، گیاکەتان، کەتان، بەزەرەک، لۆکەکێوی، گیاهەلاوە، گیا یان ڕووەکی گوش [Linum usitatissimum] 2 ڕیشاڵی گیاهەلاوە یان گوش 3 پارچە و کوتاڵی کەتانی، جاو 4 (هەروها New Zealand flax) flax-lily = (بنەڕەت: flæx ئینگلیسی کۆن، بنەڕەتێکی ئەڵمانی ڕۆژاوای هەیە) ◇ 1 کتان، بزرک، گیاه کتان 2 الیاف کتان 3 پارچه‌ی کتانی

**flaxen** /ˈflæksn/ *adjective*
1 زەردی کاڵ، قژکاڵ 2 = flax ◇ بور

**flax-lily** *noun*
کەتان‌زەمبەق: گیایێکی نیوزیلەندی کە ڕیشاڵ بەردێنێ [Phormium tenax] ◇ نوعی گیاه

**flax-seed** /flæks siːd/ = linseed

**flaxy** /flæksɪ/ *adjective*
1 گوشی، کەتانی 2 قژکاڵ، زەردی کاڵ (قژ) ◇ 1 کتانی 2 بور

**flayer** *noun*
کەوڵکەر، کەوڵکار، کەوڵچی ◇ پوست‌کن

**F-layer** *noun*
توێی ئێف: بەرزترین و بەهێزترین ناوچەی ئایۆنیتراوی ionosphere ◇ اف‌لایر

**flea** /fliː/ *noun*
(گیانەوەرناسی) کێچ، چێچ [Pulex irritans]

(کێچی مرۆ) و جۆرەکانی تر لە دەستەی Siphonaptera] ◇ کک

**flea-bag** /ˈfli:bæg/ *noun*, also fleabag

1 گیانەوەر یان مرۆی پیس و گلاو 2 هوتێلی پیس و هەرزان، کێچەلان، کێچدان، کێچخانە، کێچەلان، کونەکێچ، هێلانەکێچ: *a fleabag motel* ◇ 1 حیوان یا انسان کثیف 2 هتل کثیف

**fleabane** /ˈfli:beɪn/ *noun*

گیاکێچانە؟، کێچانکوژ؟، جۆرێ گیا لە تیرەی daisy، بەناوبانگە بۆ فەوتاندنی کێچ [*Pulicaria dysenterica* و جۆرەکانی تر] ◇ فلیبان

**flea beetle** *noun*

قالۆنچەکێچە [*Phyllotreta* و توخمەکانی تر] ◇ نوعی سوسک

**fleabite** /ˈfli:baɪt/ *noun*

1 (جێگا) پێوەدانی کێچ، هەروەها پنکەی سووری جێ پێوەدانێکی وا 2 نیگەرانییەکی کەم ◇ 1 (جای) نیش کک 2 نگرانی جزئی

**fleabitten** /ˈfli:bɪtən/ *adjective*

1 کێچپێوەداو، کێچانگاز، کێچگەستە 2 شەقوشڕ، داغن، شپرزە، شکاو، کۆن، شڕ، چەپەرەشڕ ◇ 1 ککگزیده 2 درب و داغون

**flea collar** *noun*

قەلاتە یا قەلاتگی کێچ، کێچانگ ◇ قلادەی کک

**fleadh** /flɑ:/ *noun*

فیستیڤالی موسیقا، سەما و چاندی ئیرلەندی یان سێلتی ◇ جشنوارەی موسیقی، رقص و فرهنگ ایرلندی یا سلتی

**flea market** *noun*

بازاڕی کۆنەفرۆشەکان، بازاڕی کۆنەفرۆشان ◇ بازار کهنەفروش‌ها

**fleapit** /ˈfli:pɪt/ *noun*

سینەما یان تیاتری کۆنە و پیس ◇ تئاتر یا سینمای قدیمی یا کثیف

**fleawort** /ˈfli:wɔ:t/ *noun*

(رووەکناسی) فلیورت، گیاکێچە، یاوز؟، گەلارکێشە [*Senecio integrifolius* و جۆرەکانی تر] ◇ اسپرزە، بارهنگ

**flèche** /fleɪʃ, US flɛʃ/ *noun*

میلی سەرمنارەی باریک ◇ میل سرمنارەی باریک

**fleck** /flek/ *noun*

1 پەڵە، لکە، خاڵ، پن، پنک 2 ریزە، برێ، کەمۆچکە ◇ 1 لکه، نقطه 2 ذره

**flecked** *adjective*

پەڵەپەڵە، خاڵخاڵ، خاڵاوی، گوڵگوڵ، پەڵاوی، لکاوی ◇ نقطه‌نقطه، خال‌مخال

**fled** /fled/ = past and past participle of flee

**fledged** /fledʒd/ *adjective*

پەرەوازە، باڵگرتوو، ئەتوانێ بفرێ ◇ قادر به پرواز

**fledgeling** /ˈfledʒlɪŋ/ *noun*, also fledgling

1 جووچکی پەرەوازە، تازەهەڵفریو 2 مرۆی تازەکار، بێئەزموون، نەخاراو، تازەدەستتێداو ◇ 1 جوجەی پردرآورده 2 آدم بی‌تجربه

**fleece** /fli:s/ *noun*

1 خوری 2 بەرەبرینگ، بری جاری برینەوەی مەر، چین 3 جۆرێ پارچەی نەرم و گەرم ◇ 1 پشم گوسفند 2 یک چین پشم 3 نوعی پارچه

**fleecy** /ˈfli:si/ *adjective*

خوریئاسا، لە خوری، لەخوریچوو، کوڵک، نەرم، پڕ، لۆکەئاسا، لۆکەیی ◇ پشمی، پشم‌مانند، پرپشت، پنبه‌ای

**fleer** /ˈflɪ(r)/ *noun*

گاڵتە، تیز، تیتاڵی ◇ تمسخر، ریشخند

**fleet**[1] /fli:t/ *noun*

1 کەشتیگەل، کەشتیمەنی، گەلەکەشتی، دەستەکەشتی (هێزی دەریایی یان ئاسمانی) 2 کاروان ◇ 1 ناوگان 2 قافله

**fleet**[2] /fli:t/ *adjective*

1 زووتێپەڕ، تێژپەڕ، خێرا، تیژڕەو، تونڕەو، گورج، توندوتۆڵ 2 تەنک، تەسک، کەم قووڵ بێ، پێ دەدا ◇ 1 زودگذر، بادپا، فرز 2 کم‌عمق

**fleet**[3] /fli:t/ *noun*

1 لاکەنداو، چۆمەلە، شەتاو، گلار، زێ 2 کەند، کەندال، چاڵ، خەنەک، کەندەک، خەندەک، کەندەلان ◇ 1 خور، نهر 2 کانال، خندق

**fleet**[4] /fli:t/ *adjective, adverb*

*adj* تەنک، تەسک، کەم قووڵ بێ، پێ دەدا *adv* لە تەسکاییدا، لە تەنکاییدا، لە قووڵاییی کەمدا ◇ *adj* کم‌عمق *adv* در عمق کم

**Fleet Admiral** *noun*

ئەدمیراڵی کەشتیگەل ◇ دریابُد

**fleeting** /ˈfli:tɪŋ/ *adjective*

کورتماوە، کەمخایەن، تێژپەڕ، زووبەسەرچوو، نابەردەوام، زووڕەو، سەردەمی، لەنێوچوو، *a fleeting* :transient ,transitory *a fleeting moment of ◊ glimpse/smile happiness* ◇ زودگذر، سریع، ناپایدار

**fleetingly** /ˈfli:tɪŋli/ *adverb*

تێژپەڕانە، بە شێوەیەکی کورتماوە ◇ بە طور زودگذر

**fleetingness** /ˈfli:tɪŋnəs/ *noun*

سەردەمیبوون، زووتێپەڕی، کورتماوەیی، زووبەسەرچوویی، کورتخایەنی ◇ زودگذری، گذرایی

**Fleet Street** *noun*

1 فلیت ستریت (شەقامێ لە ناوەندی لەندەن کە چەندین رۆژنامەی نیشتمانی و نووسینگەی تێدایە) 2 رۆژنامەوانان و رۆژنامەکانی لەندەن 3 چاپەمەنی گشتی ◇ 1 فلیت استریت 2 روزنامه‌نگاران و روزنامه‌های لندن 3 مطبوعات عمومی

**Fleming** /'flɛmıŋ/ *noun*
1 ڕەسەنی Flanders، فلاندەری 2 ئەندامی گەلی فلاندەری‌زمانی دانیشتووی باکووری و ڕۆژاوای بێلژیک ◯ فلاندری

**Flemish** /'flemıʃ/ *adjective, noun*
*adj* فلاندەری *n* 1 زمانی (هولەندی) فلاندەری 2 خەلکی فلاندەریز (ناوچەیێ لە نێوان بێلژیک، فەڕەنسە و هولەندا دابەش‌کراوە) ◯ *adj* فلاندری *n* زبان فلاندری 2 هلاندری

**flesh** /fleʃ/ *noun*
1 گۆشت، گۆشتی میوە، نێرک 2 تویژ، ڕووکار، ڕوو 3 لەش، جەستە، تەن 4 حەز و ویستی دەروون 5 بوونەوەرەکان (بنەڕەت: *flǣsc* ئینگلیسی کۆن، ئەلمانی‌بنەڕەت) ◯ 1 گوشت، مغز 2 بشره 3 جسم، تن 4 شهوات 5 موجودات

**flesh and blood** *noun*
1 مرۆڤ 2 (خوازە) گۆشت و خوێن ◯ 1 انسان 2 پاره‌ی تن

**flesh-coloured** *adjective*
چێرەیی کاڵ، سووری ئامالْزەرد ◯ صورتی کم‌رنگ

**flesh-eating** *adjective*
گۆشت‌خۆر ◯ گوشت‌خوار

**flesher** *noun*
1 (زۆرتر سکاتلەندی) قەساب 2 چەقۆی کەوڵ‌کردن ◯ 1 قصاب 2 فلشر

**flesh fly** *noun*
مێشی لاشە یان کەلاک، maggot ـەکانی لەسەر گۆشت دەخۆن، دەبنە هۆی myiasis [خێزان Sarcophagidae: زۆر جۆرن] ◯ مگس مردار

**fleshiness** /'fleʃinəs/ *noun*
گۆشتنی ◯ گوشتالویی

**fleshliness** *noun*
1 جەستەیێتی 2 بەئالوشی، شەهوانیەت ◯ 1 جسمانیت 2 شهوانیت

**fleshly** /'fleʃli/ *adjective* (fleshlier, fleshliest)
1 جەستەیی، گیانی، لەشی، bodily ،corporeal 2 شەهوانی، سێکشوال، بەئالۆش، lascivious: *fleshly desires* ◯ 1 جسمانی 2 شهوانی

**fleshmonger** /'fleʃmʌŋgə(r)/ *noun*
گۆشت‌فرۆش ◯ گوشت‌فروش

**fleshpot** /'fleʃpɒt, US -pɑ:t/ *noun*
شوێنی ڕابواردن ◯ عشرت‌کده

**flesh wound** /'fleʃ su:nd/ *noun*
سووکە برین (زیان نەگەیشتووە بە ئێسک و ئەندامە ژیانی یان نێوخۆیی‌یەکان vital or internal organs) ◯ زخم سطحی

**fleshy** /'fleʃi/ *adjective* (fleshier, fleshiest)
1 گۆشتی، گۆشتن، قەڵەو، خرینە، خروخۆڵ، پڕگۆشت: *fleshy arms/lips* 2 ئاودار ◯ 1 گوشتی، گوشتالو، تپل 2 آبدار

**fletcher** /'fletʃə(r)/ *noun*
(مێژوویی) تیرساز، تیرگەر، تیرفرۆش ◯ پیکان‌ساز، پیکان‌فروش

**fletching** *noun*
(مێژوویی) پەڕەکانی تیر ◯ پرهای پیکانی

**fleur-de-lis** /ˌflɜ: də 'li:, -'li:s, US ˌflɜ:r/ *noun*, also fleur-de-lys, pl. fleurs-de-lis ˌflɜ: də 'li:, 'li:s:, US ˌflɜ:r/
(ڕووەکناسی) گوڵی زیو، زیوا، گوڵی زەمبەقە، گالر (نیشانەی بنەماڵەی پاتشایی فەڕەنسەی کۆن) ◯ گل زنبق

**fleuron** /'fluərɒn, US 'flə:-/ *noun*
گوڵ‌نەخش، نەخشی گوڵ ◯ گل‌نگاره

**fleury** /'fluəri/ = flory

**flew** /flu:/ = past of fly

**flews** /flu:z/ *noun, pl.*
لچی شۆڕەوەبووی ئەستووری bloodhound یان سەگێکی هاوشێوەی وا ◯ لب‌های آویخته‌ی سگ و...

**flex** /fleks/ *noun*
وایەر، سیم (بۆ گەیاندنی تەزووی ئێلیکتریکی بۆ دەزگاین) ◯ سیم

**flexibility** /ˌfleksə'bıləti/ *noun*, also flexility /flɛk'sıləti/
نەرمی، لەداهاتنەوەهاتوویی، داهاتوویی، جیری، بگۆڕی، لەگۆڕان‌هاتوویی ◯ انعطاف‌پذیری، قابلیت تغییر

**flexible** /'fleksəbl/ *adjective*, also flexile /'flɛksʌıl/
نەرم، جیر، لەداهاتنەوەهاتوو، داهاتوو، بگۆڕ، لەگۆڕان‌هاتوو، دەچەمێتەوە، دادێتەوە، دەنووشتێتەوە: *a flexible schedule* ◊ *a more flexible* ◊ *flexible foreign policy approach* ◯ انعطاف‌پذیر، قابل تغییر

**flexibly** /'fleksəbli/ *adverb*
بە نەرمی: *Managers must respond flexibly to new developments in business practice* ◯ با انعطاف

**flexion** /'flekʃn/ *noun*, also flection
1 نەرمی، داهاتنەوە، داهاتوویی، نووشتانەوە، چەمانەوە، چەماوی 2 (ڕێزمان) گەردان(کردن) ◯ 1 انعطاف، خمیدگی 2 صرف

**flexionless** *adjective*
(ڕێزمان) لەگەردان‌نەهاتوو، گەردان‌نەکراو ◯ غیرقابل صرف

**flexitime** /'fleksitaım/ *noun*, also flextime
کاتی کارکردنی بگۆڕ، کاتی کاری خۆدیاری‌کردوو: *She works flexitime* ◯ ساعات کاری شناور

**flexor** /'flɛksə/ *noun*

ئاوەڵمەیی، کۆرپەلەیی، ئاولەمەیی، ئاولـەمەیی ◌ جنینی

**foetal position** *noun*
شوێنی ئاولەمەیی یان ئاوەڵمە(یی) ◌ موضع جنینی

**foetation** /'fi:teɪʃn/ *noun*
گـووڕانی ئاوەڵـمە، پێکهـاتن یـان دروس‌بـوونی کۆرپەلە ◌ تشکیل جنین

**foeticide** /'fi:tɪsaɪd/ *noun*
ئاولەمەکوژی، ئاوەڵمەکوژی، ئاولەمەکـوژی ◌ جنین‌کشی

**foetid** = fetid

**foetus** /'fi:təs/ *noun*, also fetus
ئاوەڵمە، ئاولەمە، ئاولەمە، کۆرپەلە ◌ جنین

**fog**[1] /fɒg, US fɔ:g, fɑ:g/ *noun*
1 (تەم‌و)مژ، دوومـان، مـژران، تومـان، چـەمان، تەم: *Patches of fog will clear by mid-morning* 2 دووکەڵ، دوومان 3 هەور 4 (وێنـە) سووتان، تاریک‌هاتن 5 تاریکی، لێڵی، ناڕۆشـنی 6 پەشۆکان، سەرلێ‌شێوان، شڵەژان: *He went through the day with his mind in a fog* ◌ 1 مـه 2 دود 3 ابـر 4 نوردیـدگی 5 تـاری 6 سراسیمگی، آشفتگی

**fog**[2] /fɒg, US fɔ:g, fɑ:g/ *noun*
بەری دووەمی گیا ◌ چین دوم علف

**fog-bank** *noun*, also fog bank
چرەتەم، بارستەی تـەم (لەسـەر دەریـا) ◌ مـه غلیظ، تودەی مه

**fogbound** /'fɒgbaʊnd, US 'fɔ:g-, 'fɑ:g-/ *adjective*
لەبەر مژ پەککەوتوو، مژگیر، گیرکردوو لەبەر مژ: *a fogbound airport* ◌ گرفتار مەتـه

**fogey** /'fəʊgi, US 'foʊgi/ = fogy

**fogged** *adjective*
1 تاریک‌هاتوو، سووتاو (وێنە) 2 سـەرلێ‌شێواو، شێواو، حەپەسـاو، پەشـۆکاو ◌ 1 نوردیـده 2 آشفته، سراسیمه، سردرگم

**foggy** /'fɒgi, US 'fɔ:gi, 'fɑ:gi/ *adjective* (foggier, foggiest)
1 مـژاوی، تـەماوی: *foggy conditions* 2 تاریـک، لـێڵ، ناڕۆشـن، نامـەعلووم، نائاشـکرا، شلوێ 3 شێواو، تێکەوڵێکە، شڵەژاو ◌ 1 مه‌آلود 2 تیره، مبهم 3 آشفته

**foghorn** /'fɒghɔ:n, US 'fɔ:ghɔ:rn, 'fɑ:g-/ *noun*
هۆڕنی مژ یان تەم (دەریاوانی) ◌ بوق مه

**fog lamp** *noun*, also fog light
گـڵـۆپ یـا چـرای مژبـڕ، چرامـژ، چـرای لەمژکارکردوو ◌ لامپ یا چراغ مەشکن

**fogou** /'fəʊgu: , US -goʊ/ *noun, pl.* fogous
جۆرێ ڕەهۆڵ یان ژووری دەسکردی ژێرعەرز، لە Cornwall دۆزراوەتەوە ◌ فوگو

**fog signal** *noun*
نیشانەی مژ (لە رێی ئاسن‌دا) ◌ علامت مه

**fogy** /'fəʊgɪ/ *noun, pl.* fogeys or fogies
مرۆڤی کۆنەپەرست، بنیادەمی کۆنەپارێز ◌ آدم امل، آدم محافظه‌کار

**fogyish** *adjective*
کۆنەپەرست، پاشبڕۆ ◌ أمّل

**fogyism** /'fəʊgɪɪzəm/ *noun*
کۆنەپەرستی ◌ ارتجاع

**föhn** /fə:n/ *noun*, also foehn
باگـەرمـە: بـایێکی گـەرمی ڕووەو باشـوور، لـە داوێنـە بـاکووری‌یەکانی شـاخ و کوێـستانەکانی ئالپەوە هەڵدەکا ◌ فون

**foible** /'fɔɪbl/ *adjective*
1 عەیب، خەوش، کەم‌وکوڕی، لایەنی لاوازی، خاڵی لاوازی 2 بەشێ لە شمشێر لە پشتێنەوە تا نووکی ◌ 1 ضعف، نقطەی ضعف 2 فویبل

**foie gras** /fwɑ: 'grɑ:/ = pâté de foie gras

**foil**[1] /fɔɪl/ *noun*
1 جـێ‌پـێ یـان شـەقڵ و بـۆنی گیانـەوەر 2 بەربەست، کۆسپ، تێشکان، بەزین ◌ 1 رد پـای یا بوی جانور 2 مانع، شکست

**foil**[2] /fɔɪl/ *noun*
1 تەڵش یان وەرەقی ناسکی کانزا، تەختەکانزا، تەبەقەکانزا، پـەرەکانزا 2 ڕەنگی پـشت ئاوێنـە 3 کاغـەزی ئالـومینیوم 4 لایـەنی بەرامبـەر، خاڵـی بەرامبـەر 5 (بیناسـازی) گـەڵا، پـەڕە، چـەماوی گەڵائاسا 6 زیواوی پشت ئاوێنە، ڕەنگەزیوینەی پـشتەوەی ئاوێنـە (بنـەڕەت: لـە *folium* لاتـین "گـەڵا") ◌ 1 ورق نـازک فلـزی 2 و 3 فویـل 4 وجه یا نقطەی مقابل 5 برگ 6 سیماب پشت آینه

**foil**[3] /fɔɪl/ *noun*
شمـشێر، شـیر (سـووک، باریـک و کـوڵ، هـی شمشێرەوانی) ◌ شمشیر

**folcin** /'fəʊləsɪn/ = folic acid

**-fold** *suffix*
پاشـگر: 1 لایەنـە، قوڵـی: *twofold* 2 لـۆ، قـەد، یـەک، بەرامبـەر، ئەونـدە: *threefold* 3 ـــــتی، لاوازی (لە ئینگلیسی کۆنەوە: *-fald*, *-feald*) ◌ پسوند: 1 جانبه 2 لا، چندان 3 ضعف

**fold**[1] /fəʊld, US foʊld/ *noun*
1 (زەویناسـی) لـۆ یـان چـەماوی لـە چـینی زەوی‌دا، لـۆ، چـین، قـەد، تـا، (دا)نووشـتاوی، گنج‌تێکەوتن، قەدکراوی 2 لۆچی ◌ 1 تـا، لا، چین، تاخوردگی 2 چین‌خوردگی

**fold**[2] /fəʊld, US foʊld/ *noun*
1 سـەرگێر، هـۆڵ، شـەوگا، ئاخـڵە (ب.ت. هـی مەڕ)؛ هۆڵەمەڕ، کەرکەمەڕ، مێگەلەمەڕ 2 دەستەی شـوێنکەوتووان، کۆمەڵـی بـڕواداران (ئـەڵـمانی بنەڕەت) ◌ 1 آغل، فولد 2 جماعت، پیروان، اتباع

**foldaway** /ˈfəʊldəweɪ, US ˈfoʊld-/ *adjective*
قەدکراو، کۆوەبوو، نووشتاو، دەنووشتێتەوە، قەد دەکرێ ◌ تاشو

**folded** *adjective*
قەدکراو، نووشتاو، دانووشتاو، دووتا، دووقەد، دووتابوو، دووتاکراو، توێ‌توێ ◌ تاخورده، تاشده

**folder** /ˈfəʊldə(r), US ˈfoʊld-/ *noun*
فولدێر، جێ‌تۆمارە، تۆمارەدان، کاغەزدان ◌ پوشه

**folderol** /ˈfɒldərɒl/ *noun*, also falderal
(کۆن) شتێکی بریقەدار (یا پرزریقەوبریقە) و بەلام بەکارنەهاتوو ◌ چیز پرزرق و برق و بدردنخور

**folding** /ˈfəʊldɪŋ, US ˈfoʊ-/ *adjective*
قەدکراو، نووشتاو، دەنووشتێتەوە، قەدی، قەد دەکرێ، قەد دەبێ، لەنووشتانەوەهاتوو: *a foldaway bed* ◊ *folding chair* ◌ تاشو

**folding money** *noun*
(نافەرمی) پارەی کاغەز، ئیسکناس، پوول ◌ اسکناس

**fold-up** *adjective*
کۆوەبوو، قەدکراو، نووشتاو، دەنووشتێتەوە، تا یان قەد دەکرێ ◌ تاشو

**Foley** /ˈfəʊli/ *noun*, also foley
فۆلی: ئیفێکتە دەنگی‌یەکانی سەر فیلمێ ◌ فولی

**folia** = plural form of folium

**foliaceous** /ˌfəʊlɪˈeɪʃəs/ *adjective*
1 گەلائاسا، شێوەگەلا، گەلایی، گەلادار 2 (زەوی‌ناسی) توێ‌توێ، لۆلۆ ◌ 1 برگ‌مانند، دارای برگ 2 روقەورقە

**foliage** /ˈfəʊlɪɪdʒ, US ˈfoʊ-/ *noun*
پەل‌وپۆ(پ)، پۆوپال، چڵ‌وگەلا، گەلا: *dense green foliage* ◌ شاخ و برگ

**foliar** /ˈfəʊliə(r), US ˈfoʊ-/ *adjective*
گەلایی، سەربە گەلا ◌ وابسته به برگ

**foliated** *adjective*, also foliate /ˈfəʊlɪət, US -eɪt/
1 گەلاگەلا، خاوەن گەلا، بەگەلا 2 (بیناسازی) نەخشێنراو یان رازێنراو بە گەلا 3 گەلایی، گەلائاسا ◌ 1 برگ‌دار 2 تزئین‌شده با برگ 3 برگ‌مانند

**foliation** /fəʊlɪˈʃn/ *noun*
گەلاکردن، گەلادان، گەلاسازی، گەلادەرکردن ◌ برگ‌دهی

**foliature** /ˈfəʊlɪətʃə(r)/ *noun*
پەل‌وپۆ، لق‌وپۆ، پۆوپال، گژگیی ◌ شاخ و برگ

**folic acid** /ˌfɒlɪk ˈæsɪd, ˌfəʊ-, US ˌfoʊ-/ *noun*, also pteroylglutamic acid
(زیندەکیمیا) ترش(ەلۆک)ی فۆلیک: جۆرێ ڤیتامینی تێکەڵ $C_{19}H_{19}N_7O_6$، ڤیتامینێ کە ب.ت. لە سەوزەکان، جەرگ و گورچیلەدا دۆزراوەتەوە و بۆ دروس‌کردنی خوێن و خرۆکە سوورەکانی خوێن بەکاردێترێ ◌ اسید فولیک

**folio** /ˈfəʊliəʊ, US ˈfoʊlioʊ/ *noun, pl.* folios
1 کتێبی ئەندازەگەورە 2 ئەندازەگەورە، پەرزل 3 پەری کتێب، گەلای کتێب 4 ژمارەی لاپەڕە(ی کتێب) 5 دوو لاپەڕەی رووڵەیەک یان بەرەوروو، دوو لاپەڕەی تاق و جووت ◌ 1 کتاب قطع رحلی 2 قطع رحلی 3 ورق کتاب 4 شمارەی صفحه 5 دو صفحه‌ی زوج و فرد

**foliole** /ˈfəʊlɪəʊl/ *noun*
گەلای چکۆلە، گەلاچکە ◌ برگچه

**foliose** /ˈfəʊlɪəʊs, US -z/ *adjective*, also folious
(رووەک‌ناسی، کرێژەبەردێ lichen) پڕگەلا، پڕ گەلاچکە ◌ پربرگ

**folium** /ˈfəʊlɪəm/ *noun, pl.* folia
گەلاک، ناسکەتوێ، ناسکەچین، تەنکەچین، پێکهاتەیێکی گەلائاسا، ب.ت. هی هێندێ تەختەبەرد یا لە cerebellum دا ◌ طبقه‌ی نازک

**folivore** /ˈfəʊlɪvɔː/ *noun*
(گیانەوەرناسی) گیانەوەری گەلاخۆر ◌ جانور برگ‌خوار

**folivorous** *adjective*
گەلاخۆر ◌ برگ‌خوار

**folivory** *noun*
گەلاخۆری ◌ برگ‌خواری

**folk** /fəʊk, US foʊk/ *noun, adjective*
*n* 1 خەڵک، گەل، جەماوەر، دەستە، کۆمەڵ 2 خەڵکی رەمەکی، خەڵکی ئاسایی 3 (folks) خزم، کەس‌وکار، دایک و باوک 4 خەڵک *adj* خۆجێیی، ناوچەیی، نەریتی، رەمەکی، گەلی، گەلێری (بنەڕەت: *folc* ئینگلیسی کۆن، بنەڕەت‌ئەڵمانی) ◌ *n* 1 قوم، مردم، جماعت 2 عامه‌ی مردم 3 (در جمع) قوم و خویش، پدر و مادر 4 مردم *adj* محلی، عامیانه

**folk art** *noun*
هونەری گەلی ◌ هنر قومی

**folk community** *noun*
کۆمەڵگای گەلی ◌ اجتماع قومی

**folk dance** *noun*
هەڵپەڕکێ یان سەمای نەریتی، هەڵپەڕکێی خۆجێیی یان ناوچەیی؛ پارچە موسیقایێ بۆ ئەو سەما یان هەڵپەڕکێیە ◌ رقص محلی

**folk dancer** *noun*
سەماباز یان رەخس‌کێشی نەریتی یان ناوچەیی ◌ رقاص محلی

**folkie** *noun*
گۆرانی‌بێژ یان موسیقاژەنی موسیقای گەلی یان fan ◌ فولکی

**folklore** /ˈfəʊklɔː(r), US ˈfoʊk-/ *noun*

فۆلکلۆر، زارگوتن، کەلەپوور ◌ فرهنگ عامه، ادبیات عامیانه

**folkloric** *adjective*

سەربە یان پێوەندی بە folklore ـەوە هەیە ◌ وابسته به folklore

**folklorist** /'fəuklɔ:rɪst, US 'fouk-/ *noun*

کەلەپوورەوان، فۆلکلۆرەوان (ب.ت. وەک بابەتێکی زانکۆیی؛ *adj* folkloristic) ◌ فولکلوریست

**folk memory** *noun*

یادەوەری یا بیرەوەری گەل ◌ حافظه‌ی جمعی

**folkmoot** *noun*, also folkmote

کۆبوونەوە یان ئەنجومەنی گشتی خەڵک (وەک لە هەرێم یان شارێ) لە ئینگلتەرەی سەرەتادا ◌ فولک‌موت

**folk-music** *noun*

موسیقای خۆجێیی یا ناوچەیی ◌ موسیقی محلی

**folk singer** *noun*

گۆرانیبێژی ناوچەیی یان خۆجێیی ◌ ترانه‌خوان محلی

**folk song** *noun*

گۆرانی ناوچەیی، سترانی خۆجێیی، گۆرانی گەل ◌ ترانه‌ی محلی

**folksy** /'fəuksi, US 'fouksi/ *adjective* (folksier, folksiest)

1 نافەرمی، خۆمانە، خۆماڵی، سادە، ئاسایی، گەلێری، گەلەری 2 خەڵکی ئاسایی ◌ 1 غیررسمی، خودمانی، معمولی، عامیانه 2 عامه‌ی مردم

**folk tale** *noun*

گێراوە، گێڕراوە، داستانی سنگ‌بەسنگ، ئەفسانە و داستانی باوباپیران، چیرۆکی گەلی، گەلیرۆک ◌ قصه‌ی عامیانه

**folkways** *noun, pl.*

ڕێ‌وشوێنی نەریتی ژیانی کۆمەڵێکی تایبەتی، بیروباوەری گشتی، شێوەکانی بیرکردنەوەی گشتی ◌ شیوه‌های سنتی زندگی و فکری جامعه‌ای خاص، عقاید عامه

**follicle** /'fɒlɪkl, US 'fa:l-/ *noun*

1 پیوازە (قژ)، دەمەژە، فۆلیکۆل 2 (ڕووەکناسی) کەلوو، توێکڵی دەرەوە (بنەڕەت: لە *folliculus* لاتین "کیسە یان توورەکەی چکۆلە"، چکۆلیتراوی *follies* "bellows") ◌ 1 پیاز، فولیکول 2 نیام

**follicle-stimulating hormone** *noun, abbreviation* FSH

(زیندەکیمیا) هانەی تاوەدەری پیوازە یان دەمەژە، هۆرمۆنی هاندەری فۆلیکۆل یان دەمەژە: جۆرێ هۆرمۆن کە بەهۆی پلی پێشووی anterior lobe ژێرمێشکەرژێنەوە pituitary gland دەردەدرێ و هانی هەڵدانی دەمەژە هێلکۆکەدانەکان لە هێلکەدان ovary دەدا و ovum-containing خانە سپێرم‌سازەکان sperm-forming دەگۆرجێنێ ◌ هورمون تحریک‌کننده‌ی فولیکول

**follicular** /fɒ'lɪkjʊlə/ *adjective*

پیوازەیی، سەربە فۆلیکۆل ◌ وابسته به فولیکول

**folliculate** /fɒ'lɪkjʊlət/ *adjective*, also folliculated

پیوازەدار، خاوەنی فۆلیکۆل، دەمەژەوەر ◌ دارای پیازه

**folliculitis** /fə,lɪkjʊ'lʌɪtɪs/ *noun*

ئاوسانی پیوازە یان فۆلیکۆل، دەمەژەئاوسێ ◌ آماس پیازه

**follis** /'fɒlɪs/ *noun, pl.* folles

جۆرێ کۆینی مسی یان مەفرەخی لە دوایییەکانی ڕۆم و سەردەمانی بیزانتیندا (لە لاتینەوە) ◌ فولیس

**follower** /'fɒləuə(r), US 'fa:lou-/ *noun*

مرید، شاگرد، دواکەوتوو، شوێنکەوتوو، تەککەوتوو، پەیڕەو، دوارەو، لایەنگر، پشتیوان ◌ مرید، پیرو، تابع، طرفدار

**following** /'fɒləuɪŋ, US 'fa:louɪŋ/ *adjective, preposition, noun*

*adj* 1 دوایی، دواتر، پاش‌تر، ـتر، ـدی، ژێرەوە، خوارەوە، بنەوە: *the following Answer* ◊ *afternoon/month/year/week* 2 بای یەکەوتوو، بای ڕاستەوانە *the following questions* *prep* بە دوای، لە پاش، لە دوای، لە ئەنجامی، دوابەدوای، ل دووف *n* مریدان، شاگردان، دواکەوتووان، شوێنکەوتووان، پەیڕەوان، تەککەوتووان، لایەنگران، پشتیوانان: *The band has a huge following in Italy* ◌ *adj* 1 بعد، بعدی، ذیل 2 باد موافق *prep* به دنبال، متعاقب *n* تابعان، پیروان، هواداران

**follow-my-leader** *noun*, also follow-the-leader

یاری منالان (= بەشداران لەودا دەبێ قسە و کردەوەی سەرگەورەکەیان هەڵگرنەوە) ◌ بازی کودکان

**follow-on** *adjective, noun*

دواتر، پاش‌تر ◌ بعدی

**follow-through** *noun*

1 بەردەوامی جووڵانی دەست لە دوای لێدانی لە توپەکەت داوە، بەردەوامی جووڵان دوای لێدان (لە یاری تێنیس و گۆلفدا) 2 درێژەدان، بەدواداچوون، جێبەجێ‌کردن، ڕاپەڕاندن: *The project could fail if there is inadequate follow-through* ◌ 1 ادامه‌ی حرکت پس از ضربه 2 پی‌گیری، به انجام رساندن

**follow-up** *noun, adjective*

*n* درێژەدان، بەردەوامکردن، بەدواداچوون، بەردەوام، پاشماوە، دوایی *adj* دواتر، پاش‌تر ◌ *n* ادامه، دنباله‌گیری، دنباله *adj* بعدی

**folly** /'fɒli, US 'fɑ:li/ *noun, pl.* follies
1 کەریتی، گەوجیتی، بێئەقلی، کاری گەوجانە، کــردەوەی گەوجانــە، قــسەی گەوجانــە 2 خانووبەرەی بەشکۆ و گران، خانووی شایانە، دەزگا ◌ 1 حماقت، اقدام احمقانه، حرف احمقانه 2 عمارت مجلل

**Folsom** /'fəʊlsəm/ *noun, adjective*
(وەک ناوەڵناو) سەربە چاندی Palaeo-Indian ی ئەمریکای باکووری و ناوەندی (یان بەری رۆژهــەلاتی چیاکـــانی راکـــی Rocky)، دەگەرێتەوە بۆ 8,000-10,500 ساڵ لەوە پێش، بــەردەچــەخمــاخی flint کــووزداری fluted بنکرووچاڵی concave base شێوەگەڵایان وەک پلار یان هاوێژە projectile بەکاردێنا (لە Folsom دێیێکـــی بـــاکووری رۆژهـــەلاتی نیومەکسیکۆ، نزیک بەوێ لە 1925 پاشماوەی سەربەو چاندە و فەرهەنگە پەیدا بووە، بڕوانە Clovis) ◌ فولسوم

**fomentation** /fəʊmen'teɪʃn/ *noun*
1 نانــەوە (ئــاژاوە، نارەزایــەتی، کێــشە و هتــد)، وروووژاندن، بزواندن، هەژاندن، instigation 2 بە ناوی گەرم شتنەوە ◌ 1 فتنەگری، فومنتاسیون، انگیزش، تحریک 2 ضماد گرم

**fomenter** *noun*
ئاژاوەنەرەوە ◌ فتنەگر

**Fon** /fɒn/ *noun, pl.* same or Fons
1 ئەندامی گەلێکی دانیشتووی بەشی خوارووی Benin 2 زمانی Kwaی ئەو گەلە ◌ فون

**fond**[1] /fɒnd, US fɑ:nd/ *adjective* (fonder, fondest)
1 هــۆگر، تامــەزرۆ، بەتاســە، خووگرتــوو، مایــل، بەپــەرۆش، خولیــا، سەوداســەر، دڵبەســتە 2 لــە ئەندازبــەدەر دڵــسۆز 3 گــەرموگورانــە، بــەتین، بەحورمــەت 4 (هیــوا، ئــاوات، هتــد) گەوجانــە، منالانە، پووچەڵ 5 خۆش‌باوەر، زووباوەر، سادە ◌ 1 علاقه‌مند، مایل، مشتاق، دوستدار، دلباخته 2 بیش از حد مهربــان 3 صــمیمانه 4 بــی‌اســاس 5 خوش‌باور

**fond**[2] /fɒnd, US fɑ:nd/ *adjective*
(فەرەنــسی) بنــەرەت، کــۆک، هــیم، خــیم، بناخــە، زەمینە ◌ اساس، پایه

**fondant** /'fɒndənt, US 'fɑ:n-/ *noun*
فۆندانت (= هەویرێکی پێکهاتوو لە شەکر، ئاو و کرێم) ◌ آب نبات

**fondle** /'fɒndl/ *noun*
دەس‌پیاهێنان (لــە رووی خۆشــەویــستی‌یــەوە) ◌ نوازش

**fondly** /'fɒndli, US 'fɑ:ndli/ *adverb*
بــە خۆشــەویــستی‌یــەوە، تامــەزرۆیانــە، لــە رووی تامەزرۆیی‌یەوە ◌ با محبت، مشتاقانه

**fondness** *noun*
خولیایی، دڵبەستەیی، خۆشەویستی، بەپەرۆشی، تامەزرۆیی، هۆگری، شەیدایی، تاسە ◌ علاقــه، محبت، اشتیاق، شیفتگی

**fondue** /'fɒndju: , US fɑ:n'du:/ *noun*
فوندو، فاندیو (جۆرێ چێشت) ◌ فوندو

**fons et origo** /ˌfɒnz ɛt 'ɒrɪgəʊ, US ɒ'rʌɪgəʊ/ *noun*
ماک و سەرچاوە، بنەما و ژێدەر، بنج و بناوان (بنــەرەت: لاتــین، لــە *fons et origo mali* "سەرچاوە و بنەرەتی خراپی") ◌ اصل و منشأ

**F₁ layer** *noun*
توێی فتی یەک، چینی فێ یان ئێفی یەک (چینی ژێر چیــنی ئێفی یەکی ئایۆنوسفێر ionosphere کــە لــە 80 تــا 120 مــایلی (یــان 130 تــا 200 کیلۆمیتری) ژوور ئاستی زەوی هەڵکەوتووە) ◌ لایه‌ی اف

**font**[1] /fɒnt, US fɑ:nt/ *noun*
1 حەوزی باپتیزم، بەرداوی تەوفن، تەشتی تەوفن، *the baptismal font* :stoup جێی ئاوی پیرۆز، 2 جــێ‌نــەوت (هــی چــرا و لامپــا)، جێگایــێ بــۆ شــڵەی جۆراوجــۆر 3 کــانی، ســەرچاوە، ژێــدەر، *a font of information* :fountain ,source ◌ 1 سنگاب تعمید 2 مخزن نفت 3 چشمه

**font**[2] /fɒnt, US fɑ:nt/ *noun,* also fount
فۆنت، دەستەتیپ، دەستیپ، تیپان ◌ فونت

**fontal** /'fɒntl/ *adjective*
1 ســـەربە کـــانی، ســـەرچاوەیی 2 (خـــوازە) سەرەکی، بنەرەتی، بنچینەیی ◌ 1 وابــستە بــە چشمه 2 (مجازی) اصلی

**fontanelle** /ˌfɒntə'nɛl/ *noun,* US fontanel
مەلاشوو، مەلازێ (نێوان ئێسکەکانی کەڕاکە cranium لە منداڵی شیرەخۆرە یان ئاوڵەمەدا، هێشتا تەواو خۆی نەگرتووە) ◌ ملاس، ملاج

**fontina** /fɒn'ti:nə/ *noun*
جۆرێ پەنیری زەردی کاڵی ئیتالیایی ◌ نوعی پنیر

**food** /fu:d/ *noun, adjective*
*n* خۆراک، چێشت، نان، پفە (بە زمانی منالان)، *adj The food industry* : خواردەمـــەنی: خۆراکی ◌ *n* غذا، مواد غذایی *adj* غذایی

**food bank** *noun*
شــوێنێ کــە خەڵکی هــەژار دەتــوانن لەوێنــە بــە خۆڕایی نان بخۆن، خۆراک‌خانە ◌ فووت بانک

**food chain** *noun*
1 (زیندەناسی) زنجیرەی خۆراکی: *Insects are* 2 *fairly low down (on) the food chain* hierarchy زنجیرەی خۆراکی: زنجیرەوپایەیی لەسەر بنچینەی هێز یان گرنگایەتی: *at the top of the corporate food chain* ◌ 1 و 2 زنجیره‌ی غذایی

**food for thought** *noun*
خۆراکی بیرکردنەوە، خۆراکی مێشک، شتێ کە

وات لێ‌دەکا بە وردی بیر بکەیەوە، بیرۆکەبزوێن، هاندەری بیر کردنەوە ◌ انگیزه برای تفکر

**food group** *noun*
دەستەی خۆراک ◌ گروه غذایی

**foodie** /'fu:di/ *n,* also foody
1 (نافەرمی) خۆراک‌دۆست 2 خۆراک‌ناس ◌ 1 غذادوست 2 غذاشناس

**food-mixer** *noun*
تێکەڵکەرە، لێکدەر ◌ مخلوط‌کن

**food poisoning** *noun*
ژاراویبوونی خۆراکی، پێنەکەوتنی چێشت ◌ مسمومیت غذایی

**food processor** *noun*
چەندکارە، چێشتاڕ ◌ چندکاره

**food science** *noun*
زانستی خۆراک، خۆراک‌ناسی ◌ علم تغذیه

**food stamp** *noun,* also food coupon
کوپێنی خۆراک (کە حکومەتی ئەمریکا بە هەژارانی دەدا) ◌ بن غذا

**foodstuff** /'fu:dstʌf/ *noun*
کەرەسە یان ماکی خۆراکی، مادەی خۆراکی ◌ مادەی غذایی

**food subsidy** *noun*
باربوو یان یارمەتی خۆراک یا خواردەمەنی ◌ یارانەی مواد غذایی

**food supplies** *noun, pl.*
خواردەمەنی، ئازووخە ◌ آذوقه

**food value** *noun*
بایەخ یان نرخی خۆراکی، سوود یاا قازانجی خۆراکی ◌ ارزش غذایی

**fool**[1] /fu:l/ *noun, adjective*
*n* 1 مرۆی گەوج و کەر 2 تەڵخەک، گاڵتەجاڕ *adj* کەر، گەوج، گەوجانە ◌ *n* 1 آدم احمق 2 دلقک *adj* احمق، احمقانە

**fool**[2] /fu:l/ *noun*
فوول (= تێکەڵەیێکی میوە، شەکر و توێشکە) ◌ فول

**foolery** /'fu:ləri/ *noun, pl.* fooleries
1 کەرێتی، گەوجێتی 2 ڕەفتاری گەوجانە، هەڵس‌وکەوتی کەرانە 3 قسەی کەرانە ◌ 1 حماقت 2 رفتار احمقانە 3 حرف احمقانە

**foolhardily** /'fu:lhɑ:dɪli, US -hɑ:rdɪli/ *adverb*
1 هەڵەشانە، سەرچڵانە 2 گەوجانە ◌ 1 با بی‌پروایی 2 احمقانە

**foolhardiness** /'fu:lhɑ:dinəs, US -hɑ:rdinəs/ *noun*
1 هەڵەشەیی، سەرچڵی، سەرپێوەنان 2 نەزانی، کەرێتی، گەوجێتی ◌ 1 بی‌پروایی 2 حماقت

**foolhardy** /'fu:lhɑ:di, US -hɑ:rdi/ *adjective* (foolhardier, foolhardiest)
1 هەڵەشە، سەرچڵ 2 گەوج، گەوجانە، کەرانە ◌ 1 بی‌پروا 2 احمق، احمقانە

**foolish** /'fu:lɪʃ/ *adjective*
1 گەوج، کەر، بودەڵە، بێ‌مێشک 2 پێکەنینی، گاڵتەجاڕ 3 گەوجانە: *a* ◊ *a -ish idea/dream* ◌ 1 احمق 2 مضحک 3 احمقانە *-ish mistake*

**foolishly** /'fu:lɪʃli/ *adverb*
لە ڕووی کەرێتی‌یەوە، گەوجانە ◌ احمقانە

**foolishness** /'fu:lɪʃnəs/ *noun*
1 کەرێتی، گەوجێتی: *Jenny had to laugh* 2 پێکەنینێتی، گاڵتەجاڕبوون، *at her own -ess* گاڵتەجاڕێتی ◌ 1 حماقت 2 مضحکیت

**foolproof** /'fu:lpru:f/ *adjective*
1 جێی باوەڕ، هەڵەهەڵنەگر، بێ‌هەڵە، لێ‌ڕاپێنراو 2 سادە، ئاسان: *a foolproof plan* ◌ 1 خطاناپذیر 2 سادە

**foolscap** /'fu:lskæp/ *noun*
پەڕی تاقی‌کاری، کاغزی گەورە (بۆ لەسەر نووسین)، کاغزی پەڕزل (ئەندازەی 200 × 300 میلی‌میتر) ◌ ورق امتحانی

**fool's errand** *noun*
کاری هیچەکە یا بێهوودە یا لەخۆوە، کاری ڕەنج بە خەسار ◌ کار عبث

**fool's gold** *noun*
بەردەزێڕینە، پیریت pyrite ◌ طلای حمقا

**fool's paradise** *noun*
خۆش‌خەیاڵی، بەهەشتی درۆ (یان فشە)، شادی و بەختەوەری خەیاڵی، بەهەشتی خەیاڵی ◌ سعادت الکی، دولت مستعجل

**fool's parsley** *noun*
گیان‌گیر؟: جۆرێ گیای گوڵسپی ژاراوی، لە تیرەی parsley، بۆن‌ناخۆش و گەڵا fern ئاسا [*Aethusa cynapium*] ◌ نوعی گیاه

**foos** = foosball

**foosball** *noun,* also foos
تۆپێنی سەرمێز (زۆرتر وەک وەرزشێ وایە تا کایە) ◌ فوسبال

**foot** /fʊt/ *noun, adjective, pl.* feet /fi:t/
*n* 1 پێ، پا (لە خوارووی قولاپەوە) 2 ژێر، خوارەوە، خوارترین بەش، داوێن، بێ، بنار، بن، بنک 3 خوارووی گۆرەوی، پنەوەی گۆرەوەی 4 بنەما، پایە (لە هەڵبەستی ئینگلیسی‌دا) 5 هەنگاو، گاف، شەقاو 6 پیادە، سپای پیادە 7 فووت، پێ (یەکەی درێژایی بەرامبەر بە 30/48 سانتی‌میتر یان 12 ئینچ) *adj* 1 پێیی، پایی (لە بەرامبەر دەستی‌دا) 2 پیادە ◌ *n* 1 پا 2 پایین، پایین‌ترین قسمت، دامنە، تە 3 پایین جوراب 4 رکن 5 قدم 6 پیادە، پیادەنظام 7 فوت *adj* 1 پایی 2 پیادە

**footage** /'fʊtɪdʒ/ *noun*
1 درێژایی (بەپێی پێ)، پێناز، پایێو، ئەندازە 2 برشتە فیلمێ، تێکە فیلمێ، فووتاژ ◌ 1 طول،

اندازه 2 فوتاژ

**foot-and-mouth disease** *noun*, US also hoof-and-mouth disease

تەبەق، تەبەک (لە ئاژەڵدا و لە دەم و لاق و جاروبار لە نێوزگیان، تووش دەبن بەهۆی serotype ی picornavirus ـەکان (جۆرەکانی *Foot-and-mouth disease virus* لە توخمی *(Aphthovirus* ◌ تب برفکی

**football** /'fʊtbɔ:l/ *noun*, American football

1 تۆپێن، تۆپی‌پێ، گۆلانێ، گۆگایێ، تۆپی تۆپێن 2 کێشە، گێچەڵ، گرفت، جووڕە ◌ 1 فوتبال، توپ فوتبال 2 معضل

**footballer** /'fʊtbɔ:lə(r)/ *noun*

یاریزانی تۆپێن ◌ بازیکن فوتبال

**footballing** /'fʊtbɔ:lɪŋ/ *adjective*

تۆپێنی، سەربە تۆپێن ◌ وابسته به فوتبال

**football pools** *noun, pl.*, also the pools

گرێو یان مەرج‌کردنی تۆپێن، گرێو لەسەر فوتبۆل ◌ شرط‌بندی فوتبال

**footbath** /'fʊtbɑ:θ/ *noun*

پێ‌شۆرکە (ئەستێلک یان حەوزی چکۆلانە) ◌ پاشویه

**footboard** /'fʊtbɔ:d/ *noun*

تەختەپێ، تەختەپا، ژێرپێ، تەختەی بەری پێ، جێ‌پێ ◌ تختەی پا

**footbrake** /'fʊtbreɪk/ *noun*

وەستێنەی پێی یان پایی ◌ ترمز پایی

**foot-breadth** /'fʊtbrɪð/ *noun*

بانایی پێ یان پا ◌ پهنای پا

**footbridge** /'fʊtbrɪdʒ/ *noun*

پردی پیادەڕێ، پردی پیادەکان، پردی لەسەر ڕۆیشتن، پردی پاپەڕینەوە ◌ پل عبور پیاده

**foot-cloth** /'fʊt klɔ:θ/ *noun*

پایەناز، پاڕاخەرە ◌ پای‌انداز

**-footed** *adjective*

(لە لێکدانا) ـپێ، پاـ ـپێیی، ـپایی ◌ ـپا، ـپایی

**-footer** /'fʊtə(r)/ *adjective*

(لە لێکدانا) بالا، بەژن ◌ قد

**footfall** /'fʊtfɔ:l/ *noun*

1 دەنگی پێ، تەپە، تەپەی پێ، خشپە، خرمەی پێ 2 ژمارەی ئەو کەسانە کە پێکەوە لە کاتێکا دەچنە ژووری (وەک دووکان و هتد) ◌ 1 صدای پا 2 فوتفال

**foot-fault** *noun*

هەڵەی پێ، پێ‌فۆلت، لەسەر هێڵ پێ‌دانان ◌ خطای پا

**foothills** /'fʊthɪlz/ *noun, pl.*

زورک، تەپە، گردی بەر کێو، تەپی بناری کێو ◌ تپه‌های پای کوه

**foothold** /'fʊthəʊld, US -hoʊld/ *noun*

1 جێ‌پێ، هەنگاوگە، جێگای پێ لەسەرنان 2 (خوازە) جێگای لێ‌ڕاپێنراو، هەلومەرجی باش ◌ 1 جای پا 2 (مجازی) موقعیت محکم

**footie** /'fʊti/ = football

**footing** /'fʊtɪŋ/ *noun*

1 جێ‌پێ، ژێرپێ، هاوسەنگی 2 ڕەوش، بارودۆخ، هەلومەرج، دۆخ، پێگە، ستاتۆس: *The two groups must meet on an equal footing* 3 پێوەندی. تێکەڵی 4 بنەڕەت، بناخە، بنگەهـ: *The company is now on a sound financial footing* 5 (بیناسازی) پشتێنە، بنکی دیوار ◌ 1 جای پا 2 وضع. وضعیت، موقعیت 3 رابطه 4 شالوده 5 ازاره

**footlights** /'fʊtlaɪts/ *noun, pl.*

چراکانی بەر شانۆ، ڕیزەچرای پێشەوەی شانۆ ◌ چراغ‌های جلو صحنه

**footless** *adjective*

1 بێ‌پێ، بێ‌پا 2 بێ‌بنچینە، بێ‌بناخە ◌ 1 بدون پا 2 بی‌اساس

**footling** /'fu:tlɪŋ/ *adjective*

بێ‌کەڵک، بێ‌قازانج، بێ‌سوود، بەکارنەهاتوو، لەخۆوە، فشە، سەرسەرەکی، هیچەکە، ئایەخ، ناگرنگ ◌ بی‌فایده، الکی، بی‌اهمیت

**footlocker** *noun*

(ئەمریکا) چەمەدان یان باوەڵی قوفڵدار ◌ چمدان قفل‌دار

**footloose** /'fʊtlu:s/ *adjective*

ئازاد، سەرسووک، نابەرپرسیار، نادەربەست، نەبەستراو، نابەند، ئازادی ئازاد، بێ‌هیچ نیگەرانیی ◌ فارغ‌البال

**footman** /'fʊtmən/ *noun, pl.* footmen

1 بەردەس، کارەکەر، نۆکەر، خزمەتکار، دەرگاوان 2 (مێژوویی) سەربازی پیادە ◌ 1 پادو، پیش‌خدمت، دربان 2 سرباز پیاده

**footmark** /'fʊtmɑ:rk/ *noun*, also footprint

جێ پێ، شوێنی پێ، شەقڵی پێ ◌ رد پا

**footnote** /'fʊtnəʊt, US -noʊt/ *noun*

1 ژێرنووس، پێ‌نقیس 2 پەراوێز، ڕوونکردنەوە، تیشکخستنەسەر 3 پرس یان مەسەلەی هیچەکە 4 لازانیاری، زانیاری پەراوێزی یان لاوەکی ◌ 1 پانوشت 2 حاشیه، توضیح 3 مسأله‌ی جنبی 4 اطلاعات جنبی

**footpace** /'fʊtpeɪs/ *noun*

هەنگاو، پێنگاف، گاف ◌ قدم

**footpad** /'fʊtpæd/ *noun*

(مێژوویی) ڕێگر، چەتە، ڕاوڕووتکەر ◌ راهزن

**footpath** /'fʊtpɑ:θ, US -pæθ/ *noun*

کوێرەڕێ، باریکەڕێ، پێڕێ، پارێ، ڕێگای پیاڕۆیشتن، پیادەڕێ ◌ کوره‌راه، راه عابر پیاده

**footplate** /'fʊtpleɪt/ *noun*

پلاتفۆرم یا هەرزاڵە یا سەکۆی شۆفیر

(شەمەندەفەر) ○ سکوی رانندە

**foot-pound** *noun*

یەکـەی وزە بەرامبـەر بـە بـڕی پێویـست بـۆ هەڵێنانی سەنگ یان قورسی یەک پەوندی بە بەرزایی یەک فووت یان پێ‌یێ ○ فوت پوند

**footprint** /ˈfʊtprɪnt/ *noun*

جێ پێ، شوێنی پێ، پێ‌شوێن، شەقڵی پێ ○ رد پا

**footrace** *noun*

پێشبڕکێی پیادەڕۆیشتن یان هەڵاتن، پێبڕکێ ○ مسابقەی راەپیمایی یا دو

**footrest** /ˈfʊtrest/ *noun*

ژێرپێ، جێ‌پێ، پاڵپشتی پێ (بۆ نموونە مۆتۆر سیکلێت) ○ زیرپایی

**foot rot** *noun*

1 پـەیـین‌گـەز، سـم‌خۆرکـە: جـۆرێ ئـازاری بەکتریایی پێی مەڕ و ماڵاتی تری وا 2 جۆرێ نەخۆشی رووەک کە لەودا بنکی گیا دەڕزێ، بنەخۆرکە ○ 1 گندیدگی سم 2 فوت روت

**foot rule** *noun*

راستەی یەک‌فوتی یان یەک‌پێیی (یان پایی) ○ خط‌کش یک‌فوتی

**footsie** /ˈfʊtsi:/ *noun*, play footsie

پـێ لـە پێـی کەسـێ خـستن (بـۆ رابـواردنی سێکـسییانە یان خۆشەویستی) ○ پـا بـە پـای کسی مالیدن

**footslogging** *noun*

لـە قـوڕ و چـڵپاودا رۆیـشتن، لـە قـوڕ هـەنگاو هەڵێنانەوە ○ گام‌برداری در گل و لای

**foot soldier** *noun*

سەربازێ کە لەسەر پێ شەڕ دەکا ○ سربازی که روی پا می‌جنگد

**footsore** /ˈfʊtsɔ:(r)/ *adjective*

(بە) پێ‌ماندوو، لەپێکەوتوو ○ پا خسته

**footstalk** /ˈfʊtstɔ:k/ *noun*

چێوکە، قنچک ○ برگ‌دم

**footstep** /ˈfʊtstep/ *noun*

1 هـەنگاو، گـاف، پێنگـاف، شـەقاو 2 جـێ‌پـا، شـوێن‌پـێ 3 ( follow (or tread) in someone's footsteps): لەسـەر رێ و شـوێنی کەسێ رۆیشتن، جێ لەسـەر پێی کەسێ دانان، پێ دانان لە جێی پای کەسێکی تر، لاسایی‌کردنەوە لە کەسێ، چاولێکەری ○ 1 قدم، گام 2 جای پا

**footsteps** /ˈfʊtsteps/ *noun, pl.*

1 دەنگی پێ، تەپەی پا، خشپە 2 جێ‌پێ، شوێنی پێ ○ 1 صدای پا 2 رد پا

**footstool** /ˈfʊtstu:l/ *noun*

چواربەند(ە)ی کورت، تەپلەک، پێ‌تەتە، ژێرپێ، کورسی کورت و نزم‌پێ، کورسی پاچکەکورت، ئەسکەمل ○ چهارپایەی کوتاە

**footstone** /ˈfʊtstəʊn/ *noun*

1 فەرهێت، بـەردی بناخـە 2 بـەردی گۆڕیچـە؟، بەردی پێیین یان پایین، دووبەردە ○ 1 سنگ شالودە 2 سنگ پایین گور

**footwall** *noun*

(زەوی‌ناسـی) پـادیوار، دیـواری خـوارووی قەڵەشتێکی لێژ ○ فوت‌وال

**footway** /ˈfʊtweɪ/ = footpath

**footwear** /ˈfʊtweə(r), US -wer/ *noun*

کـەوش، پـێڵاو، پێپـۆش، پـاپۆش ○ پـاافزار، پای‌افزار، کفش

**footwell** *noun*

جێگایێ بۆ دانانی پا لە پێشەوەی سـەندەڵی وەسیلەیێ ○ فوت‌ول

**footwork** /ˈfʊtwɜ:k, US -wɜ:rk/ *noun*

1 جووڵـەی پـێ، کـاری پـا یـان لاق 2 شـێوەی جووڵانـەوە، چارەدۆزینـەوە 3 زووکاردانـەوە، بەرچەکرداری خێرا ○ 1 حرکات پا، رقص پـا 2 طرز برخورد 3 واکنش سریع

**foot-worn** *adjective*

مانـدوو، شـەکەت، پاکـەوتـە، لـەپێ‌کـەوتوو ○ خـستە، ازپاافتادە

**footy** /ˈfʊti/ *noun*, also fotie or footer = football 1

**foo yong** /fu: ˈjɒŋ/ *noun*

جۆرێ چێشت یام سۆسی چینی ○ نوعی غذا یا سس چینی

**foozle** /ˈfu:z(ə)l/ *noun*

(نافەرمی) خـراپ لێدان، ب.ت. لە گۆلـفدا ○ ضربت نادرست

**fop** /fɒp, US fɑ:p/ *noun*

پیـــاوی زۆر شـــۆخ، لـــوتی، تـــەڕپۆش، بەدەورخۆداهاتوو ○ ژیگول

**foppish** /fɒpɪʃ/ *adjective*

فایانـە، تەڕپۆشـانە: *a foppish dressing gown* ○ ژیگول‌وار

**foppishly** /fɒpɪʃli/ *adverb*

فایانە، تەڕپۆشانە ○ ژیگول‌وار

**foppishness** /fɒpɪʃnəs/ *noun*

تەڕپۆشی، بەدەورخۆدا هاتن ○ ژیگولی

**for**[1] /fə(r), strong form fɔ:(r)/ *preposition, conjunction*

1 *prep* بۆ، ژ بۆ، لەبەر، لەسەر 2 بە مەبەستی 3 بە هۆی 4 هی، سەربە 5 رووڵە، بەرەو 6 لە باتی، لە جیاتی 7 لە لایەن، ژ ئالییێ 8 لە بەرامبـەر، لـە هەمبەر 9 بە 10 بە نرخی، بایی 11 سـەرەڕای، لەگەڵ ئەوەش‌دا، بێجگەلە ئەوەش 12 لایەنگری، سـازاو 13 بە واتای، بە مانای، بە نیشانەی 14 وەکوو 15 لە دوای، دوای، لە پاش، لە دووف 16 سەبارەت بە، لەچاو 17 پـاش 18 بـە مـاوەی، بۆ مـاوەی 19 تائـەوەی‌کـە، بـۆ ئـەوەی‌کـە *con* چونکو، چـون، لەبـەر ئـەوەی‌کـە: *We listened*

*eagerly, for he brought news of our families* ◌ prep 1 بـرای 2 بـه منظـور 3 بـه جهت، به علت 4 متعلق به 5 به سوی 6 در عوض 7 از طرف 8 در مقابل 9 بـه 10 بـه قیمـت 11 بـا وجود 12 موافق 13 به معنی، بـه علامـت 14 بـه عنوان 15 دنبال 16 نـسبت بـه 17 بعـد از 18 بـه مدت 19 برای این که *con* زیرا

**for²** /fə(r), US fɔ:(r)/ *noun*
پێدانی لەبەر شەمەندەفەردا (کە باجی ناکەوێتە سەر) ◌ فور

**fora** = plural form of forum

**forage** /'fɒrɪdʒ, US 'fɔ:-, 'fɑ:-/ *noun*
1 تفـاق، ئالیـک، واشـە، ئالـف، ئـازو، کاوگیـا، کاوێنجە 2 لەدواگەڕان، (بە شوێندا)خولانەوە، گەڕان، سووڕانەوە ◌ 1 علوفه، علیق 2 جستجو

**forage crops** *noun, pl.*
گژوگیای تفاقی ◌ گیاهان علوفه‌ای

**forager** *noun*
لەدواگەڕ، گەڕوان ◌ جستجوکننده

**foramen** /fə'reɪmen/ *noun, pl.* foramina /-'ræmɪnə/
(توێکاری) کـون، ڕۆچنـە، ڕۆچـن، ب.ت. لـە ئێسکدا (یان لە ovule ی ڕووەکی، fenestra ◌ سوراخ، روزنه

**foramen magnum** /'mægnəm/ *noun*
کونەگـەورە، ڕۆچنـەگـەورە، زلکـون (لـە کاسەسەردا، کـە دڕکـەمۆخ پیاتێدەپـەڕێ، لـە لاتینەوە "large opening") ◌ سوراخ کبیر

**foramen ovale** /'mægnəm/ *noun*
کونەهێلکـەئاسـا (لـە septum دا، نێـوان دوو گوێچکەلەی atrium دڵ کە زۆرتر لە ئاولەمەدا هەیە؛ بنەڕەت: لە لاتینەوە "oval opening") ◌ فورامن اووال

**foraminal** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە foramen ـەوە هەیە ◌ وابسته به سوراخ

**foraminated** *adjective*
کـونکـون، ڕۆچنـەڕۆچنـە، ڕۆچنـاوی ◌ سوراخ‌سوراخ

**foraminifer** /ˌfɒrə'mɪnɪfə/ *noun, pl.* foraminifers or -aminifera /ˌfɒrəmɪ'nɪf(ə)rə/
(گیانەوەرناسی) ڕۆچنەوەر، کونەوەر: لە تیرەی گیانـەوەرانی پلانکتـۆنی تـاکخانـەیی [دەسـتە Foraminiferida] ◌ فورامینیفر

**foraminiferal** /ˌfɒrəmɪ'nɪf(ə)rəl/ *adjective*
سـەربە یـان پێـوەنـدی بـە ڕۆچنـەوەر یـان foraminifer ـەوە هەیە ◌ وابسته به فورامینیفر

**foraminiferan** *noun, adjective*
(گیانـەوەرێکـی) ڕۆچنـەوەر، کونـەوەر ◌ فورامینیفران

**foraminous** *adjective*
ڕۆچنەی تیایە، کونی هەیە، ڕۆچنە یان فۆرامینی هەیە، کونی تیایە، خـاوەن کـون، خـاوەن ڕۆچنـە ◌ دارای سوراخ

**for and** *conjunction*
(بـێبـاو obsolete) و هـەروەهـا، یـش ◌ و هم‌چنین، و نیز

**forasmuch as** /ˌfɔ:r əz 'mʌtʃ əz/ *conjunction*
1 (کۆن) لەبەر ئەوە، بە هۆی 2 چونکە، چون، (بە سەرنجدان بەوەی کە) ◌ 1 نظر به این‌که 2 چون که

**forastero** /ˌfɒrə'stɛ:rəʊ/ *noun, pl.* forasteros
دارەبێگانـە (چونکـو ئـەم دارە لـە ڤـێنێزیوێلاوە نێردرا بـۆ دوورگـەکـانی هێنـدی ڕۆژاوا West Indies؛ بنەڕەت: لە سـپانیایییەوە "بێگانە") ◌ نوعی درخت

**foray** /'fɒreɪ, US 'fɔ:-, 'fɑ:-/ *noun*
1 هێرشی کتوپڕ، پارێز، پەلامار، تەپدانەسەر 2 چـەپاو، ڕاوڕووت، تـاڵان 3 (make foray) کورتە سەردان (بۆ پەیداکردنی شتێکی تایبەتی یـان سـەردانی شـوێنێکی تـازە): *weekend shopping -s to France* ◌ 1 حمله‌ی ناگهانی، شبیخون 2 غارت 3 (make foray) سفر کوتاه

**forb** /fɔ:b/ *noun*
گیا، جـۆرێ گیـای گـوڵدەرکـەر (بنـەڕەت: لـە یۆنانی *phorbē* "fodder") ◌ نوعی گیاه

**forbad** = forbade

**forbade** /fə'bæd, US fə'beɪd, fər'b-/ = past of forbid

**forbear(s)** /'fɔ:bɛ:/ = forebears

**forbearance** /fɔ:'beərəns, US fɔ:r'ber-/ *noun*
1 پـشوودرێژی، سـنگفـراوانی، لەسـەرەخۆیی، سـەبر، خـۆدداری، خـۆڕاگرتن، دەربـڕدن، تاقەتهێنـان، هەڵکردن، بەرگەگرتن، خۆگرتن، خۆگیری، patience 2 چاوپۆشی، لێبوردەیی ◌ 1 بردبـاری، شـکیبایی، خویـشتن‌داری، تحمـل 2 چشم‌پوشی، اغماض

**forbearing** /fɔ:'beərɪŋ, US fɔ:r'ber-/ *adjective*
پشوودرێژ، سنگفراوان، لێبوردە، هەڵکردوو، هەڵکردە، خۆڕاگر، خۆگیر، دەربڕدوو، بەتاقەت ◌ بردبار، شکیبا، خویشتن‌دار، متحمل

**forbears** *noun, pl.*
پێشینیان، بابوکاڵ، باوباپیران ◌ نیاکان، اجداد

**forbiddance** *noun*
نەهێشتن، نەهێلان، بەربەندی ◌ منع

**forbidden** /fə'bɪdn, US fər'b-/ *adjective*
بەربەنـد، نەهێـڵراو، قەدەخـە، هـەمێـراو، نـاڕەوا، حەرام، ڕێگەنەدراو، یاساغ: *Photography is*

◌ *strictly forrbidden in the museum* ممنوع، منع‌شده

**forbidden** /fə'bɪdn, US fər'b-/ = past participle of forbid

**forbidden degrees** *noun, pl.*
دگـەران، بەربەنـدان، بەربەنـدبووان (کـە بـۆ ژن‌ومێردایەتی نابن) ◌ محارم

**forbidden fruit** *noun*
1 میـوەی قەدەغـە(کـراو یـان بـەربـەنـدکراو) 2 خۆشـی نـارەوا یـان ڕێگەنـەدراو ◌ 1 میـوەی ممنوعه 2 لذت ممنوعه

**forbidden energy zone** *noun*
ناوچەی وزەی بەربەند(کراو) ◌ ناحیه‌ی انـرژی ممنوع

**forbidden ground** *noun*
1 ناوچـەی بەربەنـدکراو، بەربەندسـتان، دەڤـەری نەهێڵراو 2 بابەت یان چالاکی بەربەندکراو ◌ 1 منطقه‌ی ممنوعه 2 موضوع یا فعالیت ممنوعه

**forbidden things** *noun, pl.*
بەربەند(ە)مەنی، نەهێڵراوەکان، ئـەو شـتانەی کـە ڕێگەیان پێنەدراوە بکرێن ◌ ممنوعات

**forbidden vibrations** *noun, pl.*
لەرینـەوە بەربەنـد(کـراوە)کـان ◌ ارتعاشـات غیرمجاز

**forbidden zone** *noun*
ناوچەی بەربەند(کراو) ◌ ناحیه‌ی ممنوع

**forbidding** /fə'bɪdɪŋ, US fər'b-/ *adjective*
1 مـۆن، ڕووگـرژ، ڕووتـاڵ: *a forbidding appearance/look* 2 نادۆسـتانە، دوژمنانـە، ڕقەبەرانـە، ترسـناک، ترسـێنەر 3 بێـزەوەن 4 هەڕەشـەیی‌یانـە، لەگـەڵ‌هەڕەشـە، مەترسـی‌دار، threatening ◌ 1 اخمـو 2 غیردوسـتانه، رعب‌انگیز 3 نفرت‌انگیز 4 تهدیدآمیز، خطرناک

**forbiddingly** /fə'bɪdɪŋli, US fər'b-/ *adverb*
بێزەونانـە: *a forbiddingly elegant restaurant* ◌ به طور نفرت‌انگیز

**forbore** = past of forbear

**forborne** = past participle of forbear

**forbye** /fə'bʌɪ, US fɔ:-/ *adverb, preposition*
سـەرباری ئەمـەش، لەمانـەش بـوگزەری، بـەدەر لەمانـەش، سـەرەڕای ئـەوەش، besides، in addition ◌ علاوه بر این، گذشته از این

**force**[1] /fɔ:s, US fɔ:rs/ *noun*
1 زۆر، زەبر، تونـدوتیژی، زەبروزەنـگ، جـەور، زۆرەملی، سـەنگی، نهێم، هێز، سـتین، قـەوەت، شـیان، تابـشت 2 دەسـەلات (قـانوونی) 3 کـردەوەی جەسـتەیی توندوتیژانـە 4 تونـدی 5 (فیزیـک) هێـز 6 (سـەربازی) هێـز، هێزەکـان، کردەوەی سـەربازی 7 (لێداوان یان بەڵگەهێنانەوە) تۆکمەیی، بڕایی، پێز، هێز 8 هێزی سروشـتی 9 پۆلیس، هێزی پۆلیس 10 هۆکاری دیاری‌کەر، هۆکاری کاریگەر 11 گـروپ، دەسـتە، کۆمەڵـە 12 کارتـێ‌کـردن، شـوێن‌دانـان، کاریگـەری، گرنگایـەتی، باندۆر 13 پێوەری بـەهێزی بـا 14 (the forces) هێزەکـان، هێـزە چەکـدارەکان، سەربازەکان و چەک‌وچۆڵ ◌ 1 زور، خـشونت، جبر، عنف، اجبار، نیرو 2 قدرت (قـانونی) 3 اقـدام جـسمانی خشن 4 شـدت 5 (فیزیک) نیرو 6 (نظامی) نیرو، نیروهـا، اقـدام نظامی 7 اسـتحکام 8 قـدرت طبیعی 9 پلیس، نیروی پلیس 10 عامل تعیین‌کننـده 11 گروه 12 تأثیر، اهمیت، نفوذ 13 مقیاس قدرت باد 14 (در جمع) نیروها، قوای مسلح

**force**[2] /fɔ:st, US fɔ:rst/ *noun*
هەڵدێر، تاڤگە، سۆرک، سۆلاف ◌ آبشار

**forced** /fɔ:st, US fɔ:rst/ *adjective*
1 زۆرەملی، بەزۆری، بەزەبر، بـەزۆر: *forced relocation to a job in another city* 2 ناڕاست، دەسکرد ◌ 1 اجباری، به عنف 2 تصنعی

**forced entry** *noun*
چوونـەژوورەوەی بـەزۆری یـان ناقـانوونی ◌ ورود غیرقانونی

**forced labour** *noun*
کاری زۆرەملی، بێگاری، سۆزە ◌ کار اجباری

**forced landing** *noun*
نیشتنەوەی زۆرەملی، نیشتـەوەی تەنگـەتاوی ◌ فرود اجباری

**forcedly** *adverb*
بە زۆر ◌ به اجبار

**forced march** *noun*
مارشی تەنگەتاوی ◌ مارش اضطراری

**force field** *noun*
(ب.ت. لە چیرۆکە زانستی‌یەکاندا) کۆسـپ یـان بەربەسـتی نەبینراوی هێزیێ ◌ (در داسـتان‌هـای علمی) مانع نامرئی قدرتی

**forceful** /'fɔ:sfl, US 'fɔ:rsfl/ *adjective*
1 پتەو، بـەهێز، تۆکمـە: *a forceful personality* 2 بەزەبر، بەهێز، کاریگەر، کاری، چالاک 3 بڕا، یـەکلایی‌کـەرەوە، توند، سـەخت: *a forceful argument* 4 زۆرەملی، بەزۆری ◌ 1 مـستحکم 2 نیرومند، پرقدرت، مؤثر، فعال 3 قاطع 4 اجباری

**forcefully** /'fɔ:sfəli, US 'fɔ:rsfəli/ *adverb*
1 بە هێزەوە: *He argued his case forcefully* 2 توند، بە توندی ◌ 1 با قدرت 2 با شدت

**forcefulness** /'fɔ:sflnəs, US 'fɔ:rsflnəs/ *noun*
کاریگەری، باندۆر ◌ اثر

**force majeure** /ˌfɔ:s mæ'ʒɜ:(r), US ˌfɔ:rs/ *noun*
1 (قـانوونی فەرەنـسە) هێـزی سـەرتر، هێـزی superior یـان irresistible 2 بـارودۆخی

چـــاوەڕوان‌نـــەکراو، ڕووداوی پـــێش‌نـــەگیراو (بنـەڕەت: فـەڕەنـسـی "superior strength") ◌ 1 قــوەی قــاهره 2 حادثــه‌ی غیرقابــل جلــوگیری، وضعیت غیرمترقبه

**forcemeat** /ˈfɔːsmiːt, US ˈfɔːrs-/ *noun*
گۆشتی کوتراو و دەرمانک لێدراو، قیمە ◌ قیمه

**forceps** /ˈfɔːseps, US ˈfɔːrs-/ *noun, pl.* also a pair of forceps
گـاز (بنـەڕەت: لـە لاتینـەوە بـە واتـای "tongs، pincers") ◌ انبرک

**forceps delivery** *noun*
منداڵبوون بە (یارمەتی) فۆرسێپس ◌ زایمـان بـا فورسپس

**forcible** /ˈfɔːsəbl, US ˈfɔːrs-/ *adjective*
1 زۆرەملـی، تـەزویمی، زۆرەکـی، بـە زۆری 2 توندوتیژانـە، بەزەبروزەنگانـە: *The police checked all windows and doors for signs of forcible entry* ◊ 3 *forcible repatriation* 4 powerful تۆکمـە، بـەهێز، بـەنهێم، بـەزەبر، چـــالاک، کاریگـــەر، شـــوێن‌دانـــەر، کـــارا (forcibleness *n*) ◌ 1 اجباری، قهری 2 توأم با خشونت 3 محکم، قوی 4 فعال، مؤثر

**forcibly** /ˈfɔːsəbli, US ˈfɔːrs-/ *adverb*
1 بە زۆری، زۆرەملی، بە زۆرەملی: *Supporters were forcibly removed from the court* 2 بە توندی، بە سەختی ◌ 1 به اجبار 2 شدیداً

**ford** /fɔːd, US fɔːrd/ *noun*
بوار، بڕ، دەراف، تەنکاو، جێ‌پەڕینەوە ◌ گدار

**fordable** /fɔː(r)əbl/ *adjective*
شیاوی (لێ)پەڕینـەوە، پێ‌داو، تـەنک، بوار ئـەدا ◌ قابل عبور

**fordless** *adjective*
بێ‌بوار، بێ‌دەراف، بێ جێ‌پەڕینەوە ◌ بی‌گدار

**Fordism** *noun*
فـۆردیزم: لـە لایـەن بەرهـەمهێنـەری مۆتـۆری ئەمریکایی هێنری فۆرد Henry Ford (1863–1947) ◌ فوردیسم

**Fordist** *noun, adjective*
*n* فۆردیـست *adj* فۆردیـستی ◌ *n* فوردیـست *adj* فوردیستی

**fordone** /fɔːˈdʌn/ *adjective*
لەپێکەوتوو، ماندوو، شەکەت ◌ خسته

**fore**[1] /fɔː(r)/ *adjective, adverb*
پێش، لە پێش، لە پێشەوەی ◌ جلو

**fore**[2] /fɔː(r)/ *noun*
(کەشتی) سنگ، پێشەوە، پێش، پێشکە ◌ سینه

**fore-** /fɔː(r)/ *prefix*
پێـــشگر: بەشـــی پێـــشەوە، پـــێش، پێـــشەوە: *forecourt* ,*forebode* ,*foreshorten* (بنەڕەت: لە ئینگلیـسی کۆنـەوە) ◌ پیـشوند: بخـش جلـویی، جلو، قبل

**fore and aft** *adverb, adjective*
لە پێشەوە و پاشەوە، لە بەرەوە و دواوە، بەرەو پێشەوە و پشتەوە، پێشەوە و دواوە ◌ از جلـو و از عقب، به سوی جلو و عقب، جلوی و عقبی

**forearm** /ˈfɔːrɑːm, US -ɑːrm/ *noun*
(توێکـاری) قـۆڵ، باسـک، بـەوش، پـێش‌قـۆڵ، ئەرەج، ئەشک ◌ ساعد

**forebears** /ˈfɔːbeərz, US ˈfɔːrber/ *noun, pl.*
کـاڵ‌وبـاب، پێشینیان، بـاو و بـاپیران، ancestor، forefathers، هـەروەهـا precursor ◌ اجـداد، نیاکان

**forebodement** *noun*
پێشبینی، لەدڵ‌چەقین ◌ پیشگویی

**foreboding** /fɔːˈbəʊdɪŋ, US fɔːrˈboʊ-/ *noun, adjective*
*n* 1 دڵـەتەپێ، دڵـەکوتێ، نگـەرانی، دڵـلەدوایی، لەدڵ‌چەقین، پێشزانی 2 بۆقراندن *adj* نگریس، نـەگریس، بێ‌ودم، بێ‌فـەڕ، بـەدشـووم ◌ *n* 1 دلواپسی، اضطراب، حس پیش از رخـداد 2 نفـوس بد *adj* نحس

**forebrain** /ˈfɔːbreɪn, US ˈfɔːr-/ *noun*
1 (توێکاری) پێش(ەـ)مێشک، بەشی پێشەوەی مێـشک (نیـوەگۆکـانی مێـشک یـا مێـشکۆلە، تـــــالاموس thalamus و هیپۆتالاموســـــی hypothalamus تیایـــە) 2 = telencephalon ◌ بخش جلوی مخ

**forecast** /ˈfɔːkɑːst, US ˈfɔːrkæst/ *noun*
1 پـــێش‌بـــینی، بـــەربووری، پـــێش‌زانی، forethought 2 پێشبینی باری کـەش‌وهـەوا ◌ 1 پیش‌بینی 2 پیش‌بینی وضع هوا

**forecast** = past and past participle of forecast

**forecaster** /ˈfɔːkɑːstə(r), US ˈfɔːrkæstər/ *noun*
پێشبین، پێشزان (ب.ت. باری کـەش‌وهـەوا) ◌ پیش‌بینی کننده

**forecastle** /ˈfəʊksl, US ˈfoʊksl/ *noun,* also fo'c's'le
(کەشتی) سنگ، پێشەوە، پێش، پێشکە ◌ سینه

**forecited** /ˈfəʊsaɪtɪd/ *adjective*
(لەوە)پێش‌وتراو یان باس‌کراو ◌ سابق‌الذکر

**foreclosure** /fɔːˈkləʊʒə(r), US fɔːrˈkloʊ-/ *noun*
1 دەس‌بەســـەراگرتن، داگیرکـــردن، گـــرتن، لێ‌سەندنەوەی مافی خاوەندارێتی (ملکی بارمتە، نەدانـەوەی قـەرز، دارایـی و هتـد) 2 نەهێـشتن، ڕێگرتن ◌ 1 ضبط، توقیف 2 منع

**forecourt** /ˈfɔːkɔːt, US ˈfɔːrkɔːrt/ *noun*
1 پێش‌خـانوو، حەوشـەی پێش‌مـاڵ، پـێش‌مـاڵ (وەکوو گاراج، هوتێل و هتد) 2 بەشێ لە یاریگە

(لە) نێوان هێڵی سێرڤیس و تۆڕ، پێش تۆڕ، پێشەوە هێڵی سێرڤیس ◌ 1 جلوخان 2 جلو خط سرویس

**foredeck** /'fɔːdek/ *noun*
بەشی پێشەوەی پشت یا دێکی کەشتی ◌ فوردک

**fore-edge** *noun*
(تکنیکی) لێواری ئەستوونی دەرەوەی پەڕەکانی کتێب ◌ فورادج

**foredoomed** /fɔː'duːmd, US fɔːr'd-/ *adjective*
(چارەنووس) لەسەردراو یان نووسراو، واڵێدراو ◌ محکوم به

**forefathers** /'fɔːfɑːðərz, US 'fɔːrf-/ *noun, pl.* also foremothers
کالوباب، پێشینیان، باو و باپیران ◌ اجداد، نیاکان

**forefinger** /'fɔːfɪŋgə(r), US 'fɔːrf-/ *noun*
قامکی شادە، دۆشاومژە، شادەنوێژ، پێش قامک ◌ انگشت سبابه

**forefoot** /'fɔːfʊt, US 'fɔːrfʊt/ *noun, pl.* forefeet
1 (ڕەشەوڵاغ) دەس، پاچکەی پێشەوە، پێی پێشەوە 2 بەر یان پەنجەی پێڵاو، پێشترین بەشی کەوش 3 بەشی هەرەپێشەوەی keelی کەشتییێ ◌ 1 دست 2 و 3 فورفوت

**forefront** /'fɔːfrʌnt, US 'fɔːrf-/ *noun*
1 ڕیزی پێشەوە، پێشڕیز، هێڵی پێشەوە: *Women have always been at the -refront of the Green movement* 2 لەپێشەوە، لەپێش ◌ 1 صف مقدم، خط مقدم 2 صدر

**foregoing** /'fɔːgəʊɪŋ, US 'fɔːrgoʊɪŋ/ *adjective, noun*
*adj* پێشوتراو، لە سەروو باس کراو: *the -oing discussion* *n* ئەوەی کە لەسەرەوە هاتووە، ئەوەی کە باس کراوە: *The foregoing is a description of the proposed plan* ◌ *adj* سابق‌الذکر، مذکور *n* آنچه ذکر شد

**foregone** = past participle of forego

**foregone conclusion** *noun*
ئەنجامی پێشبینی کراو یان لەوەپێش دیاری کراو ◌ نتیجەی مسلم

**foreground** /'fɔːgraʊnd, US 'fɔːrg-/ *noun*
1 پێش خان، پێشەوە، بەشی پێشەوەی دیمەن، وێنەیێ و هتد، نزیکترین بەش لە بینەرەوە 2 (خوازە) جێگای سەرنج 3 دیارترین شوێن ◌ 1 پیش‌زمینه 2 کانون توجه 3 برجسته‌ترین جای

**foregut** *noun*
(توێکاری و گیانەوەرناسی) بەشی پێشەوەی زگ (بەرەو دەم دەچێ) ◌ قسمت جلو شکم

**forehand** /'fɔːhænd, US 'fɔːrh-/ *noun*
1 لێدانی پێش‌دەسک، لێدانی بە پێشەوە دەسک یا ڕاکێت، فورهەند 2 بەشی پێشەوەی ئەسپ، پێشەڵ ◌ فورهند

**forehanded** *adjective*
دووربین، داهاتووبین، بەمشوور، دوورئەندیش، دەس‌پێوەگر ◌ آینده‌نگر، صرفه‌جو

**forehead** /'fɔːhed, 'fɒrɪd, US 'fɔːrhed, 'fɔːred, 'fɑːr-/ *noun*
1 ناوچاوان، تەختی ناوچاوان، تەوێڵ، ئەنی، هانیە، نوتک 2 پێش ◌ 1 پیشانی 2 صدر

**foreign** /'fɒrən, US 'fɔːrən, 'fɑːrən/ *noun*
1 دەرەکی، دەرەوەیی، دەرەوە: *foreign* 2 لە *foreign affairs ◊ news/policy/trade* دەرەوەی وڵات، هەڵکەوتوو لە دەرەوەی وڵات (خۆ) 3 بێگانە، بیانی، لایەدە، نەناس، لاوەکی، غەوارە، غەیرە، نائاشنا، ناشناس، نائاسایی 4 بێگانە، بیانی، لە لایەن دەزگای پاراستنەوە وەک بەشێکی خۆ ناناسرێتەوە: *foreign proteins* (foreignness *n*) ◌ 1 خارجی، خارجه، اجنبی 2 خارج از کشور 3 ناآشنا، بیگانه، نامأنوس 4 فارین

**foreign affairs** *noun, pl.*
کاروباری دەرەوە ◌ امور خارجه

**foreign aid** *noun*
فریاکەوتنی دەرەوە، یارمەتی لە دەرەوە ◌ کمک‌های خارجی

**the Foreign and Commonwealth Office** *noun*, also Foreign Office, *abbreviation* FCO
وەزارەتی دەرەوە ◌ وزات امور خارجه

**foreign body** *noun*
تەنی دەرەوە ◌ جسم خارجی

**foreign-born** *adjective*
لە دەرەوە لە دایک بوو، دەرووەزا، دەرەزا ◌ متولد خارج

**foreign correspondent** *noun*
پەیامنێری دەرەوە، هەواڵنێری دەرەوە ◌ خبرنگار خارجی

**foreigner** /'fɒrənə(r), US 'fɔːr-, 'fɑːr-/ *noun*
دەرەکی، بیانی، بێگانە، نەناس ◌ خارجی، غریبه

**foreign exchange** *noun*
پارەی دەرەوە، دراو ◌ ارز

**Foreign Legion** *noun*
لیژیۆنی بێگانە یان بیانی (لە فەرەنسە و بۆ شەڕی کۆلۆنییەکانی فەڕەنسی) ◌ فارین لژیون

**Foreign Minister** *noun*
شالیاری دەرەوە، وەزیری دەرەوە ◌ وزیر امور خارجه

**Foreign Office** *noun*
(لە بریتانیا) شالیارگەی دەرەوە، وەزارەتی دەرەوە ◌ وزارت امور خارجه

**Foreign Secretary** *noun*
(لە بریتانیا) شالیاری دەرەوە، وەزیری دەرەوە ◌ وزیر امور خارجه

**Foreign Service** = Diplomatic Service
**foreignness** *noun*
بیانیتی، دەرەکیتی، بێگانەیی ◌ بیگانگی
**foreknowledge** /fɔːˈnɒlɪdʒ, US fɔːrˈnɑːl-/ *noun*
پێشزانی، زانستی غەیب ◌ علم غیب
**foreland** /ˈfɔːlənd, US ˈfɔːr-/ *noun*
سەر، زمانەزەوی، پێشزەوی، زەوی دەرپەڕیو یا پێشەوەهاتوو ◌ دماغه
**foreleg** /ˈfɔːleg, US ˈfɔːrleg/ *noun*
(چوارپێیان) پێی پێشەوە، پاچکەی پێشەوە، دەس(ت) ◌ دست
**forelimb** *noun*
باڵ، پەرەکە یا پەلی پێشەوە ◌ باله یا عضو جلو
**forelock** /ˈfɔːlɒk, US ˈfɔːrlɑːk/ *noun*
پەرچەم، تەنبووری، پۆپ، کاکۆڵ، فۆکلە، چاخ، تونجک، پەرچەم یان کاکۆڵی ئەسپ (بەشێک لە یاڵ نێوان هەر دوو گوێی؛ touch (or tug) one's forelock: بە نیشانەی ڕێز دەستی خۆ هەڵێنان یان بردنەسەرەوە (تا ناوچاوان) بۆ کەسێکی لە چینی باڵا) ◌ کاکل
**foreman** /ˈfɔːmən, US ˈfɔːrmən/ *noun, pl.* foremen
1 سەرکار، سەرکرێکار، سەرپاڵە، سەرکاریگەر 2 سەرۆک یان وتەبێژی دەستەی سوێندخۆران ◌ 1 سرکارگر 2 رئیس یا سخنگوی هیأت منصفه
**foremanship** /ˈfɔːmənʃɪp, US ˈfɔːrmənʃɪp/ *noun*
سەرکاری، سەرکرێکاری، سەرپاڵایی، سەرکاریگەری ◌ سرکارگری
**foremast** /ˈfɔːmæst/ *noun*
دارالای پێشەوە (کەشتی، نزیک لە پێشەوەی کەشتی) ◌ دکل جلو
**foremost** /ˈfɔːməʊst, US ˈfɔːrmoʊst/ *adjective, adverb*
1 ناسراوترین، ناودارترین 2 گرنگترین 3 باشترین، چاکترین 4 سەرەکی، بنچینەیی 5 (لە)پێشترین، لەپێشەوەترین، پێشتر لە هەموو ◌ 1 معروفترین 2 مهمترین 3 بهترین 4 اساسی 5 مقدمترین
**forename** /ˈfɔːneɪm, US ˈfɔːrn-/ *noun,* also first name
نێو، ناوی چکۆلە، پێشنێو، بەرناو ◌ اسم کوچک
**forenamed** *adjective*
پێشوتراو، لەوەپێشباسکراو، لەوەپێشهاتوو ◌ سابق‌الذکر
**forenoon** /ˈfɔːnuːn, US ˈfɔːr-/ *noun*
بەیانی، بەرلە نیوەڕۆ، پێشنیوەڕۆ ◌ صبح
**forensic** /fəˈrensɪk, US -ˈrenzɪk/ *adjective*
1 دادگایی، سەربە دادگا 2 دادپەروەریانە، دادگەریانە 3 قانوونی: *forensic evidence/medicine* ◌ 1 وابسته به دادگاه 2 قضایی 3 قانونی
**forensically** /fəˈrensɪkli, US -ˈrenzɪkli/ *adverb*
لەباری قانوونییەوە ◌ از نظر قانونی
**forensic medicine** *noun*
پزشکیی قانوونی ◌ پزشکی قانونی
**forensic science** *noun*
زانستی دادگەری، زانستی دادپەروەری ◌ علم قضایی
**forensic scientist** *noun*
زانای دادگەری ◌ عالم قضایی
**foreordained** *adjective*
بڕیارلەسەردراو، لەوەپێشدیاریکراو، مەقەدەر، وا بڕاوەتەوە، چارەنووسلێدراو، واچارەنووسراو ◌ مقدر
**foreordination** *noun,* also foreordainment
چارەنووس، لەوە پێشدیاریکردن، وابڕینەوە، پێشدیاریکردن ◌ تقدیر، تعیین از پیش
**forepart** /ˈfɔːpɑːt/ *noun*
1 بەشی پێشەوە، یەکەمبەش، سەروسنگ 2 بەشی سەرەتایی، بەشی دەسپێک 3 خولی سەرەتا، یەکەم سەردەم ◌ 1 قسمت جلویی، بخش قُدامی 2 بخش آغازی 3 دوره‌ی نخستین
**forepast** *adjective,* also forepassed
ڕابردوو، بووری ◌ گذشته
**forepaw** *noun*
پەنجەی دەستی گیانەوەر ◌ پنجه‌ی دست جانور
**foreplay** /ˈfɔːpleɪ, US ˈfɔːrp-/ *noun*
پێشبزوێنی، چنگەفلیقێ (بزواندنی لایەنی بەرامبەر بە مەبەستی ئامادە کردن لەباری سێکسییەوە) ◌ پیش‌نوازش
**forequarters** *noun, pl.*
دەست و بەشی پێشەڵی چوارپێ ◌ فورکوارترز
**forerank** /ˈfɔːræŋk/ *noun*
ڕیزی پێشەوە، پێشڕیز ◌ صف جلو
**forerunner** /ˈfɔːrʌnə(r)/ *noun*
1 پێشەنگ، پێشدار، ڕچەشکێن، سەرکێش: *Country music was undoubtedly one of the forerunners of rock and roll* 2 پێشەکی 3 نیشانە، بەرژەنگ ◌ 1 طلیعه، پیش‌قراول 2 مقدمه 3 نشانه، مظهر
**foresaid** *adjective*
(کۆن) لەوەپێش باسکراو، پێشوتراو، لەسەرقسەکراو، aforesaid ◌ سابق‌الذکر
**foresail** /ˈfɔːseɪl, ˈfɔːsl, US ˈfɔːrseɪl, ˈfɔːrsl/ *noun*
بادەوەی کەشتی، بادەوەی سینە، باگەڕی سەرەکی کەشتی، چارۆکەی کەشتی، دارڵای پێشەوەی کەشتی ◌ بادبان سینه، بادبان اصلی کشتی
**foresaw** /fɔːˈsɔː , US fɔːrˈsɔː/ = past of

foresee

**foreseeable** /fɔ:'si:əbl, US fɔ:r's-/ *adjective*

لەپێشبینیهاتوو، شیاوی پێشبینی، پێشبینی دەکرێ ۞ قابل پیش‌بینی

**foreseen** /fɔ:'si:n, US fɔ:r'si:n/ = past participle of foresee

**foreseer** *noun*

پێش‌بین، داهاتووزان، پێشزان ۞ پیش‌بینی‌کننده

**foreshank** *noun*

1 قەلەمە یان لوولاکی ولاخ 2 گۆشتی لوولاکی ولاخ ۞ فورشانک

**foreshock** *noun*

پێش‌لەرزە ۞ پیش‌لرزه

**foreshore** /'fɔ:ʃɔ:(r), US 'fɔ:rʃ-/ *noun*

گوێی دەریا، پاڵدەریا، پێش‌کەنار ۞ لب دریا

**foreshortened** *adjective*

چکۆلەوەبوو، چکۆلەکراو ۞ کوچک‌شده

**foresight** /'fɔ:saɪt, US 'fɔ:rs-/ *noun*

1 دووربینی، دوورنواری، دووررووانی، داهاتووبینی، بەمشووری، داهاتووزانی، پێشبینی، دوابینی 2 (تفەنگ) سەرستیرە، سیرە، مەگەسە ۞ 1 مآل‌اندیشی 2 (تفنگ) مگسک

**foreskin** /'fɔ:skɪn, US 'fɔ:rs-/ *noun*, also prepuce

پێش‌چەرمە، خەلەلە؟، سەلکەپۆش (کە سەلکی چووک یان سیرەت penis دادەپۆشێ) ۞ قُلفه

**forest** /'fɒrɪst, US 'fɔ:r-, 'fɑ:r-/ *noun*

1 دارستان، دەحەل، جەنگەل، جەنگەلستان، خەلیش، گەبەلە 2 راوگە، جێ‌راو 3 کەلەکە، کۆما، چڕەڕیز، ریزەچڕ ۞ 1 جنگل 2 شکارگاه 3 انبوه

**forestation** /fɔ:'seɪʃn/ *noun*

چەقاندنی دارستان ۞ جنگل‌کاری

**forestay** /'fɔ:steɪ/ *noun*

تەناف یان گوریسێ کە دارالای پێشەوە لە نووچکەوە تا پشت لە پێشەوەی کەشتی رادەگرێ (یان مەهار دەکا) ۞ فوراستای

**forested** /'fɒrɪstɪd, US 'fɔ:r-, 'fɑ:r-/ *adjective*

دارستان‌داگرتوو، داپۆشراو لە دارستان، دارستان‌پۆش ۞ پوشیده از جنگل

**forester** /'fɒrɪstə(r), US 'fɔ:r-, 'fɑ:r-/ *noun*

دارستانەوان، نزارەوان ۞ جنگل‌بان

**forestry** /'fɒrɪstri, US 'fɔ:r-, 'fɑ:r-/ *noun*

1 زانست و پرەکتیسی چەقاندن، پاراستن و بەڕێوەبردنی دارستان، دارستانەوانی 2 دارستانەکان، جەنگەلەکان ۞ 1 جنگل‌داری 2 جنگل‌ها

**forest tent caterpillar** *noun*

تەتلەمیرانی چادری دارستان، تەتلەمیرانی خێوەت یان کاولی دارستان [ *Malacosoma disstria* لە خێزانی Lasiocampidae] ۞ نوعی پروانه

**foretaste** /'fɔ:teɪst, US 'fɔ:rt-/ *noun*

1 پێشەکی 2 مەزە، پێشەچێژ، لەوەپێش تاقی‌کردنەوە (بەکەمی)، پێش‌تاقی 3 نموونە ۞ 1 مقدمه 2 آزمایش قبلی 3 مثال

**forethought** /'fɔ:θɔ:t, US 'fɔ:rθ-/ *noun*

دووربینی، بەمشووری، داهاتووبینی، داهاتووزانی، پێشبینی، دوابینی ۞ مآل‌اندیشی، آینده‌نگری

**foretime** /'fɔ:taɪm/ *noun*

رابردوو، بووری، سەردەمی رابردوو ۞ گذشته

**foretoken** /'fɔ:təʊk(ə)n/ *noun*

سەرەتا، پێش‌نیشان، نیشانەی پێشەکی ۞ مقدمه

**foretold** /fɔ:'təʊld/ = past and past participle of foretell

**foretop** /'fɔ:tɒp, US -təp/ *noun*

کاکۆڵ، پەرچەم، تووکی ناوچاوان (ب.ت. ئەسپ) ۞ موی پیشانی

**foretopmast** /fɔ:'tɒpmɑ:st, US -məst/ *noun*

بەشی دووەمی دارالای پێشەوەی کەشتی بادەوەدار ۞ فورتاپماست

**foretopsail** /fɔ:'tɒps(ə)l, US -seɪl/ *noun*

چارۆکەی زوور دارالای پێشەوەی کەشتی ۞ فورتاپسایل

**forever** /fər'evə(r)/ *adjective*

1 هەمیشە، بۆ هەمیشە، هەتاهەتا، تاسەر، بۆ هەتاهەتا، هەتاهەتایە، بۆ یەکجاری، لەسەریەک، بەیتاپەیتا، یەکبینە، شەوڕۆژ، ماوەیەکی یەکجار زۆر، *is ◊ wants to live -rever* :continually 2 بڕی *forever making bad puns* ۞ 1 برای همیشه، مدام، تا ابد، یکریز، یک عمر 2 پاینده‌باد

**forevermore** = forever

**forewent** /fɔ:'went, US fɔ:r'went/ = past of forego

**forewing** *noun*

باڵی پێشەوە (هەر دووکیان) ۞ بال‌های جلور

**forewoman** /'fɔ:wʊmən, US 'fɔ:rw-/ *noun, pl.* forewomen

سەرکار، سەرکرێکار، سەرباڵا (ژن) ۞ سرکارگر

**foreword** /'fɔ:wɜ:d, US 'fɔ:rwɜ:rd/ *noun*

پێشەکی، پێش‌وتە، کورتە پێشەکی (ب.ت. کاتێ لە لایەن کەسێکی تر بێجگەلە نووسەر دەنووسرێ) ۞ مقدمه، دیباچه، مقدمه‌ی مختصر

**forex** = foreign exchange

**forfeit** /'fɔ:fɪt, US 'fɔ:rfət/ *noun, adjective*

*n* 1 سزابانە، زیان، تاوان، هەلانە، جەریمە، پێ‌بژاردن 2 لەکیس‌چوون، لەدەس‌دان، لەدەس‌چوون 3 دەس‌بەسەراگرتن، لێ‌سەندن 4

نرخ، بەها *adj* 1 لەکیس‌چوو، لەدەس‌دراو، لەدەس‌چوو 2 دەس‌بەسەراگیراو ◌ *n* 1 جریمه 2 فقدان 3 ضبط 4 قیمت *adj* 1 از دست رفته 2 ضبط‌شده

**forfeiture** /'fɔːfɪtʃə(r), US 'fɔːrfətʃər/ *noun*
سزایانە، بژێرە، جەریمە، پێ‌بژاردن، تاوان: *the forfeiture of property* ◌ جریمه، تاوان

**forgave** /fə'geɪv, US fər'g-/ = past of forgive

**forge** /fɔːdʒ, US fɔːrdʒ/ *noun*
1 ئاسنگەری، دووکانی ئاسنگەری 2 کوورەی ئاسنگەری 3 کوورەی قاڵ‌کردن یا تواندنەوەی کانزاکان (لە *fabrica* لاتینی، شتێکی بەرهەم‌هاتوو، کارگە) ◌ 1 دکان آهنگری 2 کورەی آهنگری 3 کورەی ذوب فلز

**forged** *adjective*
هەڵبەستە، درۆ، ساختە، فرۆفێڵاوی ◌ جعلی

**forger** /'fɔːdʒə(r), US 'fɔːrdʒ-/ *noun*
1 ساختەچی، ساختەکار، گزیکار 2 ئاسنگەر ◌ 1 جاعل 2 آهنگر

**forgery** /'fɔːdʒəri, US 'fɔːrdʒ-/ *noun, pl.* forgeries
هەڵبەستن، ساختەکاری، گزی، فرت‌وفێڵ، fake ◌ جعل

**forgetful** /fə'getfl, US fər'g-/ *adjective*
1 لەبیربەرەوە، فەرامۆش‌کار. کەمیاد، کەم‌هۆش، بێ‌بیر 2 کەمتەرخەم، گوێ‌پێنەدەر، نادرەبەست، بێ‌خەیاڵ ◌ 1 فراموش‌کار 2 غفلت‌کار

**forgetfully** /-fəli/ *adverb*
لەبیربەرەوانە، فەرامۆش‌کارانە ◌ فراموش‌کارانه

**forgetfulness** *noun*
لەبیربەرەوەیی، کەمیادی، بێ‌بیری، فەرامۆش‌کاری ◌ فراموش‌کاری

**forget-me-not** *noun*
گوڵە ئەوین، خەلاتە گیا، گیاخەلات، گوڵ یان گیای لەبیرمەکە [*Myosotis scorpioides* و جۆرەکانی تر] ◌ گیاه یا گل فراموشم نکن

**forgettable** /fə'getəbl, US fər'g-/ *adjective*
ئاسایی: *a forgettable movie* ◌ معمولی

**forgetter** *noun*
لەبیربەرەوە، بێ‌بیر، فەرامۆش‌کار ◌ فراموش‌کننده

**forging** *noun*
1 ئاسنگەری 2 پیاکێشان، کوتک‌کاری 3 کانزای کوتراو، کوتکە ◌ 1 آهنگری 2 پتک‌کاری 3 فلز پتک‌کاری‌شده

**forgivable** /fə'gɪvəbl, US fər'g-/ *adjective*
شیاوی لێ‌خۆشبوون، شیاوی چاپۆشی، لەبەخشین‌هاتوو، لەبوردن‌هاتوو، هیچ نییە، دەبەخشرێ ◌ قابل بخشایش، قابل اغماض

**forgivably** /fə'gɪvəbli, US fər'g-/ *adverb*
لەبەخشین‌هاتووانە ◌ به طور قابل بخشایش

**forgiven** /fə'gɪvn, US fər'g-/ = past participle of forgive

**forgiveness** /fə'gɪvnəs, US fər'g-/ *noun*
لێ‌خۆشبوون، لێ‌بوردن، بەخشین، بەخشایشت، جەبە، چاوپۆشی: *to pray for God's forgiveness* ◌ *the forgiveness of sins* ◊ *forgiveness* بخشایش، عفو

**forgiver** *noun*
لێبووردە، لێ‌خۆشبوو، بەخشەر، چاوپۆش، بەبەزەیی، دڵنەرم، دڵۆڤان ◌ باگذشت، بخشنده

**forgiving** /fə'gɪvɪŋ, US fər'g-/ *adjective*
لێبووردە، لێ‌خۆشبوو، بەخشەر، چاوپۆش، بەبەزەیی، دڵنەرم، دڵۆڤان: *She had not inherited her mother's forgiving nature* ◌ باگذشت، بخشنده

**forgivingly** /fə'gɪvɪŋli, US fər'g-/ *adverb*
لێبووردانە ◌ با بخشندگی

**forgoer** *noun*
چاوپۆش، لێخۆش‌بوو، لێبووردە ◌ صرف‌نظرکننده

**forgone** /fɔː'gɒn, US fɔːr'gɔːn, -'gɑːn/ = past participle of forgo

**forgot** /fə'gɒt, US fər'gɑːt/ = past of forget

**forgotten**[1] *adjective*
لەبیرەوەچوو، لەیادنەماو، لەبیرنەماو، فەرامۆش‌کراو ◌ فراموش‌شده

**forgotten**[2] /fə'gɒtn, US fər'gɑːtn/ = past participle of forget

**forint** /'fɒrɪnt/ *noun*
یەکەی بنەرەتی پارەی هەنگاریا، بەرامبەر بە سەد filler ◌ فورینت

**fork** /fɔːk, US fɔːrk/ *noun*
1 چنگاڵ، چەناڵ، ملێبۆک 2 شەن، شەنە، هەسک، درگان، گۆ، کاریچ، تەبور، ملێب، قەلەپیسک، هیرگووش، سێ‌دەندەک، پەنجە، پەنجەقازی (ئامێری کشت‌وکاڵ) 3 دووریانە، دووڕیانە 4 (لق)لێبوونەوە، پەڵ‌لێبوونەوە 5 دوولقانە، دووفلیقانە، دووحاچە، دوولکانە (دووچەرخە) 6 بنی ران، گەڵ، ناوگەڵ، خەرک ◌ 1 چنگال، چنگک 2 دوراهی 3 انشعاب 4 دوشاخه 5 بیخ ران

**forked** /fɔːkt, US fɔːrkt/ *adjective*
1 چنگاڵ‌ئاسا، چەتاڵ‌ئاسا 2 دوولقانە، لقاوی، لک‌لک، چەڵەمەیی، لق‌لق، دووفلیقانە، دوولکانە، دوولکە، دوولیە، دووفاق، دووپەل، دووشاخە، داقلیشاو، داتلیشاو، لق‌لێوەبوو، پەڵ‌هاویشتوو: *a bird* ◊ *the forked tongue of a snake with a forked tail* ◌ 1 چنگال‌مانند 2 دوشاخه، چندشاخه، منشعب، انشعاب‌دار

(زمانـــەوانی، هـــەروەها free morpheme
مۆرفیمی ئازاد ◇ adj خودانگیخته n تکواژ آزاد

**freehand** /'fri:hænd/ *adjective, adverb*
(کێشراو) بەدەست، دەستی، بێ‌شت، بێ کەرەسە، بێ‌ئامێر: *freehand drawing* ◇ ترسیم‌شده با دست، بی‌افزار

**free hand** *noun*
دەســـەڵاتی تـــەواو، دەس کـــراوە، هەمووشـــت لەدەس‌هاتوو ◇ اختیار تام

**free-handed** /ˌfri:'hændɪd/ *adjective*
دلاوا، بـــەدەس‌ودڵ، دەس‌ودڵ‌بـــاز، بەدەهنـــدە (free-handedness *n* :free-handedly *adv*) ◇ سخی، گشاده‌دست

**free-hearted** /ˌfri:'hɑ:tɪd/ *adjective*
1 دڵگـەورە 2 قـــەڵەڕوو، لەڕوودانـەماو (-free 1 :free-heartedness *n* :heartedly *adv*
دڵگـــەورەیی 2 قـــــەڵەڕوویی، لەڕوودانـــەمان، بێ‌قەڵەودەلەیی) ◇ 1 بلندنظر 2 صریح

**freehold** /'fri:həuld, US -hould/ *noun, adjective*
*n* 1 خاوەنداریتی دیاری‌نەکراو یا هەمیشەیی، *adj* خاوەنـــداریتی ئـــازاد 2 مـــڵکی تـــەواو هەمیـــشەیی، تـــەواو، نەبـــەکرێ ( freeholder :/'fri:həuldə(r), US -hould-/ *n*
خاوەنـــداری دیـــاری‌نـــەکراو، خاوەنـــداری هەمیشەیی، خاوەنداری ئازاد یان تەواو) ◇ *n* 1
مالکیت مطلق 2 ملک طلق *adj* طلق

**free house** *noun*
(بریتانیـــا) بیرەفرۆشـــی، ئاوجۆفرۆشـــی ◇
ابجوفروشی

**free kick** *noun*
(لە تۆپێن‌دا) لێدانی ئازاد، تێهەڵدانی ئازاد ◇
ضربەی آزاد

**freelance** /'fri:lɑ:ns, US -læns/ *adjective, noun,* also freelancer /'fri:lɑ:nsə(r), US -lænsər/
*adj* ئازاد، دانەمەزراو، سەربەخۆ *n* 1 (نووسەر، هونەرمەند، پەیامنێر و هتد) ئازاد، سەربەخۆ 2 (مێژوویی) سەربازی بەکرێ‌گیراو یان مزەوەری سەدەکانی نێوەڕاست ◇ *adj* آزاد *n* 1 مستقل 2
سرباز مزدور قرون وسطی

**free-liver** *noun*
کەسێکی زگەڕۆ، (خۆش)ڕابوێر ◇ آدم شکمباره، عشرت‌طلب

**free-living** *adjective*
1 زگەڕۆ، چڵێس 2 (زیندەناسی) ئازادژی، بە سەربەخۆیی دەژی (مشەخۆر نییە و هەروەها پێکەوەژیش نییە): *a free-living adult* ◇ *hairworm* 1 شکمباره 2 فری‌لیوینگ

**freeloader** /'fri:ləudə(r), US -loud-/ *noun*
(ئاقەرمی) مشـــەخۆر، مفتـــەخۆر، لالـــەوەڕ ◇

سەرپشکی ◇ گزینش آزادانه

**free climbing** *noun*
شـاخەوانی ئـازاد (بڕوانـە aid climbing) ◇
کوه‌نوردی آزاد

**freedman** /'fri:dmən/ *noun, pl.* freedmen
(مێژوویی) کۆیلەی ئازادکراو، کەسێکی ئازاد لە کۆیلەیی ◇ محرر

**freedom** /'fri:dəm/ *noun*
1 ئازادی، سەربەستی، سەرازایی، سەربەخۆیی، بـــەرەڵایی، نـــەگیراوی، ناکۆیلـــەیی، رزگـــاری، independence 2 مـــــافی بــــــەکارهێنان، بەکارهێنانی ناسنوورداری شتێ 3 مافی رامیاری 4 مـــاف 5 مـــافی جیابوونـــەوە یـــان تـــەڵاق 6 قسەلەڕوویی ◇ 1 آزادی، استقلال، اختیار، رهایی، نجات 2 حق استفاده 3 حق سیاسی 4 حق 5 حق طلاق 6 صراحت

**freedom fighter** *noun*
پێشمەرگە، شـەڕکەری رێـی ئـازادی، شەڕڤـانی سەربەستی ◇ چریک

**freedom of the will** *noun*
ئازادی یان سەربەستی ویست، ئازادی ئیرادە ◇
آزادی اراده

**free economy** *noun*
ئابووری ئازاد یان سەربەست ◇ اقتصاد آزاد

**free energy** *noun*
(کیمیا) وزەی سەربەست یا ئازاد ◇ انرژی آزاد

**free enterprise** *noun*
ئابووری ئازاد یان سەربەست ◇ اقتصاد آزاد

**free expansion** *noun*
(کیمیا) کشانی ئازاد ◇ انبساط آزاد

**free fall** *noun*
کەوتنەخوارەوەی ئازاد، بەربوونەوەی ئازاد ◇
سقوط آزاد

**free fight** *noun*
تێـــکهەڵـــچوون، شەڕوشـــۆڕ، ئامبـــازان، لێکبەربوون، شەڕەشەق ◇ الم‌شنگە

**free flight** *noun*
فڕینی ئازاد (فڕینی مووشەک بێ مۆتۆڕ) ◇
پرواز آزاد

**free floating** *adjective*
1 ئازاد 2 سەراوکەوتە، سواراو، سەرکەوتە ◇ 1
آزاد 2 شناور

**Freefone** *noun*
(لە بریتانیا) تەلەفۆنی ئازاد، تەلەفۆنی خۆڕایی ◇ تلفن رایگان

**free-for-all** *noun*
مشت‌وڕ، بگرەوبەردە، قرەوهەرا، لێکبەربوون، تێکهەڵچوون، شەڕوهەرا، هەرچی‌پەرچی، تێکەولێکە ◇ جر و بحث، بزن بزن

**free form** *adjective, nou*
*adj* (هونـــەر) خۆبـــەخۆ، شـــێوازی ئـــازاد *n*

سورچران

**free love** *noun*

تێکەڵی سێکسی ئازاد (بێ‌ژن و مێردایەتی) ◯ عشق آزاد

**freely** /'fri:li/ *adverb*

1 ئازادانە، ئازاد، بە سەربەستی: *-ly translated* 2 بەخۆڕایی، بەلاش 3 بە دڵاوایی، بەدەهندانەوە ◯ 1 آزادانە 2 مجانی 3 با گشادەدستی

**freeman** /'fri:mən/ *noun*, also freemen

1 پیاوی ئازاد، هاونیشتمانی ئازاد، شارنشینی ئازاد 2 ناکۆیلە، کەسێ کە serf نەبێ، نارەعیەت ◯ 1 آزادمرد، شهروند افتخاری 2 غیربردە

**free market** *noun*

(ئابووری) بازاڕی ئازاد یا سەربەست ◯ بازار آزاد

**free marketer** *noun*

بازارگێڕی ئازاد، بازاڕبەدەستی ئازاد ◯ فری مارکتر

**Freemason** /'fri:meɪsn/ *noun*

فراماسۆن، ماسۆن: ئەندامی کۆمەڵەی نهێنیی نێونەتەوەیی، بە مەبەستی پەرەپێدانی یارمەتیی دوولایەنە و پێوەندی دۆستانەی لە نێوان ئەندامانیدا ◯ فراماسون، عضو فراموش‌خانە

**Freemasonry** /'fri:meɪsnri/ *noun*, also Masonry

1 فراماسۆنیزی (سیستم و کردارەکانی فراماسۆن) 2 (freemasonry *n*) یەکێتی، هاوبیری، یەکگرتوویی، یەک‌کەوتوویی، لێک‌گەیشتن، هاوسۆزی، هەست بە یەکێتی ◯ فراماسونری

**freeness** = freedom

**free on board** *adjective, adjective*

پێدان یان بە دەستەوەدانی (کەل‌وپەل) لەسەر (پشتی) کەشتی ◯ فوب

**free pardon** *noun*

لێبوردن، لێ‌خۆشبوون، بەخشین (لە تاوانی و فەرمی‌یانە) ◯ برائت، بخشش

**free pass** *noun*

تیکێتی خۆڕایی ◯ بلیت رایگان

**free period** *noun*

ماوە یان قۆناخی ئازاد (لە خوێندنگاکاندا) ◯ دورەی آزاد

**Freephone** /'fri:fəʊn, US -foʊn/ *noun*

تەلەفۆنی خۆڕایی یان ئازاد ◯ تلفن مجانی

**freeplay** /'fri:pleɪ/ *noun*

شلەوتوندە (زنجیری مۆتۆر سیکلێت و هتد) ◯ فری‌پلی

**free port** *noun*

بەندەری ئازاد ◯ بندر آزاد

**Freepost** /'fri:pəʊst, US -poʊst/ *noun*

(لە بریتانیا) پۆستی خۆڕایی، پۆستی بەلاش ◯ پست رایگان

**free radical** *noun*

(کیمیا) ڕەگی سەربەست یا ئازاد ◯ رادیکال آزاد

**free-range** *adjective*

خۆماڵی، ماڵی، خانەکی (وەکوو هێلکە) ◯ محلی

**free rotation** *noun*

سووڕانی سەربەست یان ئازاد، خولانەوەی ئازاد ◯ چرخش آزاد

**free soil** *noun, adjective*

*n* مەڵبەند یا خاکی ئازاد (لە ئەمریکا و بەرلە شەڕی نێوخۆیی Civil War کەس بۆی نەبوو کۆیلەداری بکا) (Free-Soil) *adj* 1 دژی پەرەپێدانی کۆیلەداری لە نێو خاکی ئەمریکا بەرلە شەڕی نێوخۆیی 2 سەربە Free Soil Party (Free-Soilism *n* ،Free-Soiler *n*) ◯ فری سویل

**Free Soil Party** *noun*

پارتی مەڵبەند یا خاکی ئازاد (1845–54) دژی پەرەپێدانی کۆیلەداری لە نێو خاکی ئەمریکا بەرلە شەڕی نێوخۆیی) ◯ حزب فری سویل

**fressia** /'fri:ʒə, US 'fri:ziə/ *noun, pl.* fressias

(ڕووەکناسی) فریزیا، گوڵی فریزیا (تۆخم *Freesia*، لە ناوی پزشکی ئەڵمانی Friedrich H. T. *Freese*، مەرگ 1876) ◯ فریزیا

**free space** *noun*

شوێنی ئازاد (بێ بواری مەگناتیکی و ڕاکێشان) ◯ فضای آزاد

**free speech** *noun*

ئازادی ڕادەربڕین، ئازادی ئاخافتن، freedom of speech ◯ آزادی بیان

**free spirit** *noun*

مرۆڤی سەربەخۆ، مرۆی ئازاد یان سەربەست ◯ شخص مستقل

**free-spoken** /ˌfri: 'spəʊkn/ *adjective*

قسەلەڕوو، بێ‌پێچ‌وپەنا، بێ‌پەردە قسە دەکا، outspoken (free-spokenness *n*) ◯ رک‌گو

**free-standing** *adjective*

ئازاد، سەربەخۆ، سەربەست، جیا، ئازاد، پێوەنەنووساو، نەلکاو، بێ‌پاڵپشت: *a free-standing city* ◊ *a free-standing clinic* ◊ *a free-standing wall* ◊ *a free-standing computer store* ◯ مجزا، آزاد

**free state** *noun*, also Free State

هەرێم یان ئەیالەتی ئازاد (کە کۆیلەداری تیانەدەکرا) ◯ ایالت آزاد

**freestone** /'fri:stəʊn/ *noun*

1 بەردێ کە خۆش بتاشرێ یان خۆش‌تاش 2 میوەیێ کە بە ئاسانی ناوکەکەی لە گۆشتەکەی بێتەوە (بڕوانە clingstone) ◯ فری‌استون

**freestyle** /'fri:staɪl/ *noun*

1 پێشبڕکێی مەلێی ئازاد، باسکەمەلێ 2 (زۆرانبازی) ئازاد: *freestyle wrestling*

(freestyler *n*) ۞ 1 کرال، شنای آزاد 2 آزاد

**free-swimming** *adjective*

مەلەوانی ئازاد، ئازادمەلەوان (چونکو بە شتێکەوە نەبەستراوەتەوە): *the free-swimming larva of the barnacle* ۞ شناگر آزاد

**free-tailed bat** *noun*

شەمشەکوێرەی کلکئازاد: جۆرێکی مێرووخۆری زووفڕی streamlined [زۆر جۆرن و لە خێزانی Molossidae] ۞ نوعی خفاش

**freethinker** /ˌfriːˈθɪŋkə(r)/ *noun*

ئازادبیر، بیرازاد، نادەمارگرژ، بیرفرەهـ (freethinking *n, adj*): *n* بیرازادی، نادەمارگرژی، بیرفرەهی *adj* بیرفرەهـ بیرازاد) ۞ آزاداندیش

**free-thought** *noun*

بیرفرەهی، بیرازادی، بیرکردنەوەی ئازاد، هزرکردنی بە سەربەستی ۞ آزاداندیشی

**free trade** *noun*

کارداری ئازاد، بازرگانی سەربەست یان ئازاد (free trader *n*): لایەنگری کارداری یان بازرگانی ئازاد) ۞ تجارت آزاد

**free trade** *noun*

کارداری ئازاد، بازرگانی سەربەست یان ئازاد ۞ تجارت آزاد

**free university** *noun*

(لە ئەمریکا) زانکۆی ئازاد ۞ دانشگاه آزاد

**free variation** *noun*

(زمانەوانی) چەشن یا جۆری ئازاد ۞ گونەی آزاد

**free verse** *noun*

هەلبەستی ئازاد، هۆنەی نوێ ۞ شعر آزاد یا نو

**free volition** *noun*

ویستی ئازاد، خواستی سەربەست ۞ ارادەی آزاد

**free vote** *noun*

دەنگی ئازاد (ناچار نییە بیدا بە پارتەکەی) ۞ رأی آزاد

**freeway** /ˈfriːweɪ/ *noun*

پانەڕێ، ئازادڕێ ۞ آزادراه

**freewheel** *noun*

پێچکەئازاد، ئازادچەرخ: شت یان ئامێرێ کە چەرخی دوواوەی دووچەرخە بەبێ پالێدان دەسووڕێتەوە (freewheeler *n*) ۞ فری‌ویل

**freewheeling** /ˌfriːˈwiːlɪŋ/ *noun*

کەمتەرخەم، بێخەیال، گوێپێنەدەر، لامل، ئالۆری ۞ لاابالی

**free will** *noun, adjective*

*n* ویست، هێز یان توانایی بڕیاردان، بڕیاربەدەستی *adj* (free-will) خۆویستانە، بە پێخۆشبوون یان خۆشی خۆی، بە مەیلی خۆی، بێ زۆرەملی voluntary: *free-will offerings* ۞ ارادە، اختیار

**free world** *noun*

جیهان یان دنیای ئازاد: ئەو نەتەوانەی جیهان کە لەژێر کاریگەری یان کۆنترۆلی تۆتالیتاریەندا نین ۞ فری ورلد

**freezable** *adjective*

لەبەستنهاتوو، دەیبەستێ ۞ منجمدشدنی

**freeze** /friːz/ *noun*

1 بەستەلەک، شەختەبەندان، سەهۆلبەندان 2 چەسپاندن (کرێ، نرخ و هتد) ۞ 1 یخبندان 2 تثبیت

**freeze-dried** *adjective*

بە ڕێگای بەستنەوە وشککەوەکراو، بەستەوشکێنراو ۞ بە طریق انجماد خشکاندەشدە

**freeze-drying** *noun*

وشککردنەوە یان وشکاندنی بە بەستن ۞ خشکانیدن انجمادی

**freeze-frame** *noun*

1 ڕاگرتن، وێنەی ڕاگیراو 2 دوگمەی ڕاگرتن (ڤیدیۆ) ۞ 1 عمل مکث کردن، قاب ایستا 2 دکمەی مکث

**freezer** /ˈfriːzə(r)/ *noun*

بەستێنەر، جێسەهۆل، بەستنگە ۞ فریزر

**freeze-up** *noun*

بەستەلەک، شەختەبەندان، سەهۆلبەندان ۞ یخبندان

**freezing** /ˈfriːzɪŋ/ *adjective, noun*

*adj* یەکجار سارد، شەختەبەند، تۆفوبەند، سارد وسڕ *n* (تێمپراچێر) سیفر، خالی بەستنی ئاو (0°C) ۞ *adj* بسیار سرد، سرد *n* صفر

**freezing-point** *noun*

خالی بەستن یان جەڕدان، (تێمپراچێر) سیفر ۞ نقطەی انجماد، صفر

**F region** *noun*

ناوچەی ئێف: بەرزترین ناوچەی ئایۆنوسفێر، لە نێوان 80 مایل (130 کیلۆمیتر) تا 300 مایل (500 کیلۆمیتر) دایە ۞ منطقەی اف

**freight** /freɪt/ *noun*

1 هەلگرتن، بردن 2 کرێبار 3 بار، کەلوپەل 4 شەمەندەفەری بارهەلگر یان باری ۞ 1 حمل 2 کرایەی بار 3 محمولە 4 قطار باری

**freightage** /freɪtɪdʒ/ *noun*

1 هەلگرتن، بردن 2 کرێبار ۞ 1 حمل 2 کرایەی بار

**freight car** *noun*, also wagon

واگۆن یان عەرەبانەی بارهەلگر یان باری ۞ واگن باری

**freighter** /ˈfreɪtə(r)/ *noun*

1 بارهەلگر (کەشتی یا فڕۆکە) 2 بارلێنەر، بارچی ۞ 1 باربر 2 بارکنندە

**freightliner** *noun*

شەمەندەفەری بارهەلگری تونرەو ۞ قطار باری

سريع‌السير
**freight train** *noun*
شەمەندەفەری بارهەڵگر یان باری ◌ قطار باری
**French** /frentʃ/ *adjective, noun*
*adj* سەربە فەرەنسە، فەرەنسەیی، فەرەنسی *n* زمانی فەرەنسی (لە چەند بەشێکی بێلژیک، سویسرا، کەنەدا و هیندێ وڵاتی تر قسەی پێدەکرێ، *adj* ◌ (Frenchness *n* وابسته به فرانسه *n* زبان فرانسه
**the French** /frentʃ/ *noun*
خەڵکی فەرەنسە، گەلی فەرەنسە، فەرەنسییەکان ◌ فرانسویان
**French bean** = green bean
**French braid** = French plait
**French bread** *noun*
نانی فەرەنسی، نانی باگێت ◌ نان باگت
**French Canadian** *noun*
کەنەدی فەرەنسی‌زمان ◌ کانادایی فرانسه‌زبان
**French chalk** *noun*
گەچی فەرەنسی، گەچی دروومان یان خەیاتی ◌ گچ خیاطی
**French cricket** *noun*
کریکێتی فەرەنسی ◌ کریکت فرانسوی
**French door** = French window
**French dressing** *noun*, also vinaigrette
سۆسی سرکە ◌ سس سرکه
**French fries** *noun. pl.*
قاشەپەڕەماسی سوورەوەکراو ◌ سیب‌زمینی سرخ‌کرده
**French horn** *noun*
هۆرنی فەرەنسی ◌ کُر
**Frenchi** = Frenchy
**Frenchification** *noun*
کردنەفەرەنسی، فەرەنساندن ◌ فرانسوی‌سازی
**French kiss** *noun*
ماچی فەرەنسی (زمانەکان لێک‌کەون) ◌ بوسه‌ی فرانسوی
**French leave** *noun*
(نافەرمی) فێزماڵک، خۆدزینەوە، جیفرک (لە کار و بە بێ‌دەستوور (یان بە پەنامەکی) ◌ جیم شدن
**French letter** = candom
**French loaf** = baguette
**Frenchman** *noun, pl.* Frenchmen
پیاوی فەرەنسی، فەرەنسی ◌ مرد فرانسوی
**French marigold** *noun*
(ڕووەکناسی) گوڵە شەستپەڕ ◌ فرنچ‌ماری‌گولد
**French nettle** *noun*, also Joseph's coat
(ڕووەکناسی) چاڤ‌رەشۆک ◌ حُسن یوسف
**French plait** *noun*
پەلکەی فەرەنسی ◌ بافه‌ی فرانسوی
**French polish** *noun*
رۆن یا ڕەنگی جەلا، لاکی نەلکۆل ◌ روغن جلا
**French seam** *noun*
بندروو(یی)، ژێردروویی، حەوت‌وهەشت، نێوەدروو، درووماتی لە ژێرەوە ◌ پس‌دوزی
**French tickler** *noun*
(نافەرمی) جیر یا کاندۆمی ڕێڕێ ◌ کاپوت خط‌خط
**French window** *noun*
پەنجێرەی دووتایی یان دوودەری، دەرگای شووشەیی (کە بەرەو باخ یان باڵکۆن دەکرێتەوە) ◌ پنجره‌ی دولنگه
**Frenchwoman** *noun, pl.* Frenchwomen
ژنی فەرەنسی، فەرەنسی ◌ زن فرانسوی
**Frenchy** *noun*, also Frenchie
(سووکانە) مرۆی فەرەنسی ◌ آدم فرانسوی
**frenetic** /frəˈnetɪk/ *adjective*
پڕووزە، پڕتین، بەگوڕ، پڕچالاک، بەتین‌وتاو، گەرم‌وگوڕ، شێتانە، بەجۆش(وخرۆش)، پڕهەژیو، *to live* ◊ *a scene of frenetic activity* : جرین
frenetically /frəˈnetɪkli/ ) *at a -netic pace* *adv*: بە تینەوە، بە گوڕەوە، شێتانە؛ (freneticism *n* ◌ پرحرارت، پرتب و تاب
**frenulum** /ˈfriːnjʊləm/ *noun*, also fraenum or frenum /ˈfriːnəm/
1 (توێکاری، مێروناسی) هەوسارۆکە، هەوسارچە، هەوسارە، بەست 2 هەوسار، لەغاو، پالەنگ، دەسەجڵەو (بنەڕەت: لاتینی نوێ، چکۆلێنراوی *frenum* لاتین "bridle") ◌ 1 فرینولوم، بندیزه 2 لگام
**frenzy** /ˈfrenzi/ *noun, pl.* frenzies
1 ڕەفتار یان هەڵس‌وکەوتی شێتانە، شێت‌بوون (بۆ ساتێ) 2 وروژانی توند یان توندوتیژانە frenzied /ˈfrenzid/ *adj*): وروژاو، هەژیو، شێت، لەکۆنترۆڵ‌دەرچوو، هەوسارپساندوو، شێتگیر؛ frenziedly *adv*: شێتانە، شێتگیرانە) ◌ 1 حرکات جنون‌آمیز 2 هیجان خشونت‌آمیز
**frequency** /ˈfriːkwənsi/ *noun*, also frequence
1 فراوانی، زۆری، فرەهی 2 دووبارەبوونەوە، زۆرڕوودان، زۆرقەومان، چەندبارەبوونەوە، چەندپاتەیی 3 (فیزیک) لەرە، لەرینەوە 4 (ڕادیۆ) شەپۆل ◌ 1 کثرت، تواتر، تناوب، تعدد 2 کثرت وقوع، تکرار 3 (فیزیک) بسامد 4 موج
**frequencymeter** *noun*
لەرەپێو ◌ بسامدسنج
**frequent** /ˈfriːkwənt/ *adjective*
1 زۆر، فرەهە، فرە، فراوان، لەسەریەک، زووزوو، بەیتاپەیتا 2 دووبارەوەبوو، پەستایی، چەندبارەوەبوو، ، چەندپاتە، زۆرڕووداو، پڕڕووداو، زۆرقەوماو 3 ئاسایی، باو، هەمیشەیی، *He is a frequent visitor* :usual .common
4 *a frequent visitor* ◊ *to this country*

(بیـ‌بـاو) full، thronged 5 (کـۆن) intimate، familiar (n frequenter: هـات‌وچۆکـەر؛ (frequentness /'fri:kwəntnəs/ n 1 ◌ متعدد، وافر، فراوان، پی‌درپی 2 مکرر، کثیرالوقوع 3 عادی، دائمی

**frequent** /'fri:kwəntli/ *adverb*
زۆرجـار، بـە زۆری، زۆر، گـەلێ، گـەلێ جـار، زۆربەی جاران، جارەهای جار: *Buses run frequently between the city and the airport* ◌ اغلب، غالباً، به دفعات، زیاد

**frequentation** /fri: kwen'teɪʃn/ *noun*
هات‌وچۆ، هام‌وشۆ ◌ تردد، رفت‌وآمد

**frequentative** /frɪ'kwentətɪv/ *adjective, noun*
*adj* هەرئـەو، دووبـارەوەبوو، چەنـدبـارەوەبوو، چـەندپاتـە *n* کـاری دووبـارەوەبوو، کـاری چەندبارەوەبوو یان دووپاتی ◌ *adj* تکراری *n* فعل تکراری

**fresco** /'freskəʊ, US -koʊ/ *noun, pl.* frescoes or frescos
کێشانەوەی دیـواری، دیوارکێشی، لەسـەردیوار کێشانەوە، دیوارنەخشێنی: *The ceiling is richly decorated in marble and fresco* (frescoed *adj*) ◌ نقاشی دیواری

**fresh** /freʃ/ *adjective*
*adj* 1 تازە، نـەو، نـوێ، تـەڕ، تـەڕوتازە، تەڕوبڕ، ئاودار، گەش‌وتازە، گوڵ‌بەدەم 2 خـاوێن، تـەمیز، (چێشت و ئـاو) تـازەلێنراو، نـەماوە، تـازە، کـۆن نیـە، نابـەیات 3 (ئاو) شیـرین، خـۆش، نەسـوێر، سووک 4 فێنک، سارد 5 (با) توند، بەقـەوەت 6 بەکـەیف، خۆشـحاڵ، بـەگوڕ، بـەتین 7 روودار، بێ‌حـەیا، بـێ‌شـەرم 8 تازەکـار، خـاو، نوکـار *n* سـەرەتا، دەسپێک، هـەوەڵ ( /'freʃli/ freshly *adv*: تازە، بە تازەیی، بە تازەگی؛ freshness *n*: 1 تـازەیی، رەنـگ‌وبـۆ 2 فێنکـی 3 شـیرینی، سـووکی، خۆشـی 4 خۆشحالـی، بەکـەیفی، کەیف‌سـازی، بـەگوڕی 5 بێ‌ئەزموونی، خـاوی) ◌ *adj* 1 تازه، جدید، تر و تـازه 2 تمیـز، تـازه 3 شیرین 4 خنک، سرد 5 شدید 6 سرزنده، پرحرارت 7 پر رو 8 ناآزموده *n* آغاز

**fresh air** *noun*
هەوای تازە، هەوای ئازاد ◌ هوای آزاد

**freshener** /'freʃnə(r)/ *noun*
گەشێنەر، بەکەیف‌هێنەر ◌ تروتازه‌کننده

**fresher** /'freʃə(r)/ *noun*
خوێندکاری ساڵی یەکەم (زانکۆ یـان کـۆلێژ) ◌ دانشجوی سال اول

**freshet** /'frɛʃɪt/ *noun*
1 لافـاو، سـێلاو 2 لافـاوە ئـاوی تـازە کـە دەڕژێتـە دەریاوە ◌ 1 سیلاب 2 فرشت

**fresh gale** *noun*
بایێ کە خێرایی‌یەکەی 62 تا 74 (یان 39 تا 46 مایل) کیلۆمیتر لە سەعات‌دا بێ ◌ فرش گال

**freshman** /'freʃmən/ *noun,* also freshmen
خوێندکاری ساڵی یەکەم لە زانکۆ (لە ئەمریکا) یان خوێندنگای باڵا یان ئامادەیی ◌ دانـشجوی سال اول یا دبیرستان

**fresh-run** *adjective*
(ماسی کۆچەر، ب.ت. سەلمون یان ئازاد) تازە گەیبوە بە ئاوی تازە لە دەریاوە ◌ فرش‌ران

**freshwater** /'freʃwɔ:tə(r)/ *adjective, noun*
*adj* 1 سەربە ئاوی شیرین یا ئاوی سووک، نە لە دەریادا، ژیاو لە ئاوی شیرین‌دا 2 خاو، تازەکـار، ناشارەزا، دەس‌خاو، بێ‌ئەزموون، ناپوخت *n* ئاوی شیرین، ئاوی سووک، ئاوی ناسوێر (ب.ت. وەک سەرچاوەیێکی سروشتی) ◌ *adj* 1 وابسته بـه آب شیرین 2 ناآزموده، خام‌دست *n* آب شیرین

**fresnel lens** /freɪ'nɛl/ *noun,* also Fresnel lens
جۆرێ هاوێنە یـان لێنزی تـەخت کـە کۆمـەڵێ ئاڵقە یان بازنەی هاوناوەندی concentric هـەیـە (بنـەڕەت: لـە نـاوی فیزیـک‌زان و ئـەنـدازیاری سیڤیل فەڕەنسی *Augustin J. Fresnel*) ◌ لنز فرزنال یا فرینال

**fret**[1] /fret/ *noun*
نگەرانی، دڵ‌لەدوایی، دڵـەخوریە، دڵـەڕاوکێ ◌ اضطراب، دلشوره

**fret**[2] /fret/ *noun*
(گیتار و هتد) پەردە (fretless *adj*) ◌ پرده

**fret**[3] /fret/ *noun,* also sea set
مژ یان تەمی دەریایی ◌ مه دریایی

**fret**[4] /fret/ *noun*
1 جۆرێ نەخشی تۆڕی جوانی، ب.ت. دانەیێکی سەنگ‌ڕێژ بۆ سەر ژنان 2 زنجیرە (ی ئەندازەیی یان ئـەنـدازەمەنـد)، ب.ت هێ پـەراوێز، زۆرتر بەرجەستە و پێکهاتوو لە چەندین هێڵ یان میلی راست کە لە گۆشەی لابەلا و راست‌دا یـەکتریان دەبڕی یان لێک تێدەپەڕین ◌ فرت

**fretful** /'fretfl/ *adjective*
1 نارەحەت، بەدخوو، ناجسن، کەساس، بێ‌ئارام، ئارام‌لێ‌هەڵگیراو 2 دەم‌بەگلەیی، بەگلەیی‌وگناشت (fretfully *adv*: دەم‌بەگلەیی یانە؛ fretfulness *n*: 1 نارەحـەتی ئـارام‌لێ‌هەڵگیراوی، ناجسنی، بەدخوویی، بەدفەڕی 2 دەم‌بەگلـەیی‌بوون) ◌ 1 ناراحت، معذب، کج‌خلق 2 شکوه‌آمیز

**fretsaw** /'fretsɔ:/ *noun*
باریکە مـشار، مـشارە باریـک، مـشاری ددان‌ورد ◌ اره مویی

**fretted** /'fretɪd/ *adjective*
نەخشی تۆڕێتراو ◌ مشبک‌کاری‌شده

**fretwork** /'fretwɜ:k, US -wɜ:rk/ *noun*
نەخشی تۆڕینە، تۆڕینەکاری ◌ مشبک‌کاری

**Freudian** /'frɔɪdiən/ *adjective, noun*
*adj* فرۆیـدی، سـەربـە فرۆیـد *n* لایـەنگری زیگمونـد فرۆیـد Sigmund Freud (1856–1939) یـان شـێواز و مێتودەکـانی: *-dian* :Freudianism *n*) *psychoanalysis* فرۆیدگەری، فرۆیدباوەڕی) ◌ *adj* فرویـدی *n* طرفدار فروید

**Freudian slip** *noun*
خلیسکان یان هەڵەی فرۆیدی، هەڵەی زمانی ◌ لغزش فرویدی

**Frey** *noun*, Old Norse *Freyr*
خـودای ئـاوەدانی، بـەرهـەم، پیـت و ئاشـتی (میتۆلۆژی Norse) ◌ فری

**Freya** *noun*, Old Norse *Freyja*
خـواژنی خۆشـەویـستی و جـوانی (میتۆلـۆژی Norse) ◌ فریا

**Fri** = Friday

**friable** /'fraɪəbl/ *adjective*
1 ناسـک، نـەرم، خـاو، ڕیزەڵـۆک، هەڵـپڕوک، هەڵـپڕوواو 2 لـەهاڕینهـاتوو، لەشـکانهـاتوو (friability /ˌfraɪə'bɪlətɪ/ also friableness *n*: 1 ناسـکی، نـەرمی، خـاوی، ڕیزەڵـۆکی، هەڵپڕوکی، هەڵپڕوواوی 2 لەهاڕینهاتوویی) ◌ 1 فریابیل 2 قابل گرد شدن

**friar** /'fraɪə(r)/ *noun*
ڕەبـەن، ڕاگەیێنـەر (بنـەڕەت: لـە *frater* لاتـین "brother") ◌ راهب، مبلغ

**friarbird** *noun*
جـۆرێ هەنگـەخۆری زلـەی ئەوسترالاسـیایی سـەررەش و کـەمێ رووتـەڵـە و دەنووکدرێـژی چـەمـاو [تـوخم *Philemon*: زۆر جـۆرن] ◌ نوعی پرنده

**friar's balsam** *noun*
گیراوەیێ کە بێنزۆئینی benzoin لە ئەلکۆلدا تیایە و زۆرتر وەک دەرمانی هەڵمژین inhalant بەکاردێتری ◌ نوعی محلول

**friar's lantern** = ignis fatuus (obsolete)

**friary** /'fraɪəri/ *noun*, also friaries
دەیر، خانەقا، خانەگا، خانقا ◌ دیر، خانقاه

**fribble** *noun*
(نافەرمی) کەسێکی گەوج، شتی هیچەکە ◌ آدم احمق، چیز بی‌اهمیت

**fricandeau** /'frɪkandəʊ/ *noun, pl.* fricandeaux /-dəʊz/
(فەرەنسی) جۆرێ چێشت ◌ نوعی غذا

**fricassee** /'frɪkəsiː/ *noun*
فری‌کەیسی (= چێشتی گۆشت یا مریشک لەگەڵ سۆسی سپی؛ fricasséed *adj*) ◌ فری‌کَسه

**fricative** /'frɪkətɪv/ *adjective, noun*
*adj* خشـەیی، لێکخشـاو، خشـێنەرانە (ب.ن. f (وەک fee) و th) *n* نـەبزوێنی خـشـەیی ◌ *adj* سایشی *n* هم‌خوان سایشی

**friction** /'frɪkʃn/ *noun*
1 لێکخشـان، خـشـان، لێکخـسـتن 2 کێشـە، ململانـێ، جیـاوازی بـیـروڕا (frictional /'frɪkʃənl/ *adj*: سـەربە یـان پێـوەنـدی بـە لێـکخـشـانەوە هـەیـە؛ frictionless *adj*: 1 بێلێکخشان، بێخشان 2 بێکێشە، بێململانێ، بێجیاوازی بیروڕا؛ بنەڕەت: بە ڕێگای فەرەنسی، لـە (-*frictio(n* لاتـین، لـە *fricare* "لێخسـتن، لێخشاندن، پاهێنـان to rub") ◌ 1 اصـطکاک، سایش 2 اختلاف

**friction tape** = insulating tape

**Friday** /'fraɪdeɪ, US -di/ *noun, adv*
*n* هەینی، ڕۆژی هەینی، جومعە *adv* هەینییان، هەر هەینییێ، هەر جومعە جارێ (بنەڕەت: لە *Frīgedæg* ئینگلیسی کۆنەوە، لە ناوی خواژنی ئەڵمانی *Frigga* وەرگیراوی *Veneris dies* late Latin "ڕۆژی هەسارەی ناهید Venus") ◌ *n* جمعه، آدینه *adv* هر جمعه یکبار

**fridge** /frɪdʒ/ *noun*
بەفرخەرە، یەخچاڵ (کورتەی refrigerator) ◌ یخچال

**fridge-freezer** *noun*
بەفرخـەرەبەسـتێنەر، یـەخچـاڵفریزێـر ◌ یخچال‌فریزر

**fried** /fraɪd *adjective*
1 سـوورەوەکراو 2 (ئـەمریکـا و نافـەرمـی) exhausted ◌ سرخ‌کرده

**fried** /fraɪd/ = past and past participle of fry

**fried chicken** *noun*
مریشکی سوورەوەکراو ◌ مرغ سرخ‌کرده

**fried magnet** *noun*
شتی جوانی کە بە بەفرخەرەوە دەنرێ، ماگنێتی یەخچاڵ ◌ ماگنت یخچال

**friend** /frend/ *noun*
1 دۆست، برادەر، ڕەفیق، هاوڕێ، هاودەم، یار، هەڤاڵ 2 یارمەتیدەر، بەهانـەوەچوو، لایـەنگر، داژدار، پـشـتیوان 3 (لـە شـەڕدا) یـەکگرتـوو، هـەڤگرتـوو، یـەککـەوتوو، هاوپـەیمان 4 (Friend) – Quaker ◌ 1 دوسـت 2 کمـک، جانبدار، حامی 3 متحد، متفق

**friendless** /'frendləs/ *adjective*
تەنیا، تەنیاباڵ، بێکەس، بێخاوەند، تاکوتەنیا، بێیار ◌ بی‌کس

**friendly** /'frendli/ *adjective* (friendlier, friendliest), *noun* (*pl.* friendlies)
*adj* دڵـسـۆز، گـەرموگـوڕ، دۆسـتانە، برایانـە، خۆشەویـستانە، دۆسـت *n* (هـەڕوەها friendly match) یـاری دۆسـتـانە (friendliness *n*): خۆشەویـستی، دۆستایەتی، هەڤاڵـەتی، برایـەتی، دڵـسـۆزی) ◌ *adj* صـمیمی، دوسـتانه، صـمیمانه،

دوست n دیدار دوستانە

**Friendly Society** *noun*
کۆمەڵەی هاوکاری (کە لەودا لە کاتی پیری یان نەخۆشی ئەندامەکانیاندا یارمەتییان دەدەن) ◌ انجمن تعاون

**Friend of Dorothy** *noun*
(نافەرمی) پیاوی هاورەگەزباز ◌ مردهمجنس‌باز

**friendship** /ˈfrendʃɪp/ *noun*
1 دۆستایەتی، هەڤاڵەتی، دۆستانی، سەروسەخت، رفێقایەتی 2 پێوەندی یان تێکەڵی دۆستانە ◌ 1 دوستی، رفاقت 2 رابطەی دوستانە

**frier** = fryer

**Friesian** /ˈfriːʒn/ *noun*
(لە بریتانیا) فریزن، فریزن (← جۆری مانگای بەڵەک کە شیریکی زۆر دەدا، لە بنەڕەتدا لە Friesland ی هولەندەوە) ◌ فریزن

**frieze**[1] /friːz/ *noun*
(بیناسازی) فریز (نێوان architrave و cornice؛ friezelike *adj*؛ بنەڕەت: لە *Phrygium (opus)* لاتین "(کار)ی Phrygia") ◌ کتیبە، افریز

**frieze**[2] /friːz/ *noun*
جۆری پارچەی لەخوری قورس و زبر کە لایێکی ب.ت. پرووشی هەیە (بنەڕەت: لە *fries* فەرەنسی، لە *frisia* لاتینی سەدەکانی نێوەڕاست "خوری فریزیایی Frisian wool") ◌ نوعی پارچە

**frigate** /ˈfrɪgət/ *noun*
1 کەشتی پارێزەر 2 (مێژوویی) جۆری کەشتی شەڕکەری بادەوەدار ◌ 1 ناو پاسوَر 2 نوعی کشتی

**frigate bird** *noun*
جۆری باڵندەی دەنگخۆشی راوی بەروباڵڕەش، باڵدرێژی باریک و دەنووکقولاپی درێژ [توخم *Fregata*: پێنج جۆرن] ◌ نوعی پرندە

**Frigga** *noun*, Old Norse *Frigg*
فریگا: ژنی Odin و خواژنی ئاسمانەکان، مێتۆلۆژی Norse ◌ فریگا

**frigging** /ˈfrɪgɪŋ/ *adverb, adjective*
گلاو! پیسە!: *Mind your own frigging business!* ◌ کثافت!

**fright** /fraɪt/ *noun*
1 ترس، خۆف، فەرهـ، تۆقین: *to cry out in fright* 2 شت یان مرۆی ترسێنەر (*fryhto* ئینگلیسی کۆن (ناو)، بنەڕەت ئەڵمانی *fyrhto*) ◌ 1 وحشت، هراس 2 چیز یا آدم وحشتناک

**frightened** /ˈfraɪtnd/ *adjective*
ترساو، تۆقیو، زەندەقچوو، زاروچوو، ترسلێنیشتوو: *a frightened child* ◊ *Don't be frightened* ◌ وحشت‌زدە، بە هراس افتادە

**frightening** /ˈfraɪtnɪŋ/ *adjective*
ترسێنەر، ترسناک، جێی ترس، تۆقێنەر (frighteningly /ˈfraɪtnɪŋli/ *adv*: ترسێنەرانە، بە شێوەیەکی ترسناک) ◌ وحشت‌انگیز

**frightful** /ˈfraɪtfl/ *adjective*
زۆر ناخۆش، ترسناک، یەکجار خراپ، لەرادەبەدەر، terrifying: *a frightful novel*؛ frightfully /ˈfraɪtfəli/ *adv*: لە ئەندازەبەدەر، یەکجار، extreme: *frightful thirst*؛ frightfulness *n*: ترسێنەری، تۆقێنەری، ترسناکبوون، ناخۆشبوون) ◌ وحشتناک، مخوف، بد، فوق‌العادە

**frigid** /ˈfrɪdʒɪd/ *adjective*
1 سارد، بەستەڵەک، شەختەبەند، تۆفوبەند، بەستوو 2 بێهەست، وشک، ساردوسڕ، نادۆستانە 3 ژنی سارد(وسڕ؛ frigidity /frɪˈdʒɪdəti/ *n*: 1 ساردی، بەستەڵەکی، شەختەبەندی، بەستن 2 وشکی، ساردوسڕی 3 ساردمەزاجی، ساردوسڕی ژن؛ frigidly /ˈfrɪdʒɪdli/ *adv*؛ frigidness /ˈfrɪdʒɪdnəs/ *n*؛ بنەڕەت: لە *frigidus* لاتین، لە *frigere* ەوە "سەرمابوون، ساردبوون") ◌ 1 سرد، منجمد 2 بی‌روح 3 سردمزاج

**frigidarium** /ˌfrɪdʒɪˈdeːrɪəm/ *noun, pl.* frigidaria /-rɪə/
(مێژوویی، رۆمی کۆن) ساردخانەی گەرماو ◌ خنک‌خانەی حمام

**frigid climate** *noun*
ئاووهەوای بەستەڵەک یا بەستوو ◌ اقلیم منجمد

**frigid zone** *noun*
ناوچەی بەستوو، هەرێمی بەستەڵەک، بەستەڵەکان ◌ منطقەی منجمد

**frill** /frɪl/ *noun*
1 چین: *a tablecloth with a lace frill* 2 پەراوێزی چینچین یان چیندار *around the edge* 3 (گیانەوەرناسی، رووەکناسی) ریشکۆ، ریشوو 4 (frills) شتومەکی جوانی، شتی دیندیوبۆدی، گێزوگوڵنگ، دیکۆر 5 زریقەوبریقە، ئالاوواڵا ◌ 1 والان، چین 2 حاشیەی دارای چین 3 ریشە 4 (در جمع) لوازم تزیینی، چیزهای اضافی 5 زرق و برق

**frilled** /frɪld/ *adjective*
چیندار، بەچین، چینچین ◌ والان‌دار

**frilled lizard** *noun*, also frill-necked lizard
(گیانەوەرناسی) مارمێلکە ملچرچ(نـ)ە، هی باکووری ئەوسترالیا [ *Chlamydosaurus kingii*] ◌ نوعی مارمولک

**frilly** /ˈfrɪli/ *adjective*
چیندار، چینچین: *a frilly blouse* ◌ والان‌دار

**fringe** /frɪndʒ/ *noun, adjective*
*n* 1 ریشۆلە، ریشوو، ریشکۆ، گوڵینگ، شۆڕابە، جاغ، ساچاخ 2 بڕ، پەراوێز، کەنار، دەور، گێزوگوڵنگ، زێوار، لێوار، پەراوێز یان لێواری

جوانی 3 بەشی پەراوێزی یان دەرەوەی شتێ: *the ◊ on the northern fringe of the city* *fringes of society* 4 چین 5 (جۆرێ شێوازی قژ) پەرچەم 6 شتێ زیادی یان لاوەکی 7 (وەک واتابەند یان ئاوەڵناوێ) نائاسایی، نافەرمی 8 (کۆبوونەوە، ئاهەنگ و هتد) رووداوە لاوەکی‌یەکان، رێورەسمی لاوەکی یان ناسەرکی (the fringe) 9 (کۆمەڵ یان پارتی) کەمینە *adj* لاوەکی، ناسەرەکی، پەراوێزی (*adj* fringeless: *n* fringing: *adj* fringy: ریشۆلەدار، شۆڕابەدار) ۞ *n* 1 شرابە 2 حاشیە، حاشیەی تزیینی 3 قسمت حاشیەای یا بیرونی 4 چین 5 چتری 6 چیز اضافی یا ثانوی 7 غیرمعمول، غیررسمی 8 فرینج 9 (the fringe) اقلیت *adj* فرعی

**fringe area** *noun*

ناوچەیێ کە لەودا (وەرگرتنی) شەپۆلە رادیۆیی یان تەلەفزیۆنی‌یەکان کزن weak (یان لاوازن) یان تێک دەچن ۞ مزایای جنبی

**fringe benefit** *noun*

لامووچە، سەرمووچە، سوودە لاوەکی‌یەکان، قازانجی لاوەکی، قازانجە پەراوێزی‌یەکان ۞ مزایای جنبی

**fringed** *adjective*

ریشۆلەدار، ریشکۆدار، گولینگ‌دار، پەراوێزدار، زیواراوی: *a carpet with a fringed edge* ۞ دارای شرابە، حاشیەدار

**fringed gentian** *noun*

تەشمیل یان جێنشنی ریشکۆدار [*Gentianopsis crinita*] ۞ نوعی گیاه

**fringe orchis** *noun*, also fringe orchid

گیاسەرمەی ریشکۆدار [توخم *Habenaria*] ۞ نوعی گیاه

**fringent** *adjective*

ریشۆلەئاسا، ریشکۆیی، ریشووئاسا، شێوەریشۆلە ۞ شرابەمانند

**fringe tree** *noun*

دارەریشۆلە: دارێکی چکۆلەی رۆژهەلاتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە خێزانی olive [*Chionanthus virginicus*] ۞ نوعی درخت

**fringing reef** *noun*

شۆستەی شیلانی نزیک و بە درێژایی کەنار ۞ نوعی درخت

**frippery** /'frɪpəri/ *noun, pl.* fripperies

1 ریت‌وپیت، شڕەوشاتاڵ، شڕەوبڕە: *spending money on -eries* 2 خشڵی هەرزان و بێ‌قازانج ۞ 1 خرت و پرت 2 زیور ارزان و بی‌فایده

**Frisbee** /'frɪzbi/ *noun*, also frisbee

پەپکە یان سێلکی فڕیو، قاپی فڕیو، فریزبی ۞ دیسک فریزبی

**frisée** /'fri:zeɪ/ *noun*

جۆرێ چەقچەقەی گەلالوول endive ۞ نوعی آندیو

**frise** = frieze 2

**Frisian** /'fri:zɪən, 'fri:ʒ(ə)n, 'frɪ-/ *noun, adjective*

*n* 1 خەلکی Frisia یان Friesland لە هولەند 2 زمانی ئەلمانی بەشە باکووری‌یەکانی هولەند و دورگەکانی دراوسێ *adj* سەربە فریزیا یان فریزلەند، خەلکەکەی یان زمانەکەیان ۞ فریزیایی

**frisk** /frɪsk/ *noun*

1 پشکنین، گیانگەڕان 2 هەلبەزودابەز، هەلبەڕودابەڕ، فڕکوهۆڕ، قوەتەقشقەنە ۞ 1 بازرسی بدنی 2 جست و خیز

**frisket** /'frɪskɪt/ *noun*

ماکینکی چەسپی یان ستێنسیل بۆ داپۆشینی ئەو جێگایانەی کە پێویست نیە رەنگ کرێ (بنەڕەت: لە *frisquette* فەرەنسی، لە *frisqueto* پرۆڤێنسالی، لە *frasqueta* سپانیایی) ۞ فریسکت

**frisky** /'frɪski/ *adjective* (friskier, friskiest)

بەکەیف، بەدەماغ، گەش، خۆشحال، سرک، بەنەشە، بزیو، چالاک، lively، playful: *frisky puppies* (*adv* friskily: کەیفسازانە؛ *n* friskiness: بەکەیفی، کەیفسازی، بەدەماخی، گەشی) ۞ سرزندە

**frisson** /'fri:sɒ̃, fri:'soʊn/ *noun*

(فەرەنسی) لەرزین، لەرز، ورووژان، هەژان ۞ لرزە، هیجان

**frit** /frɪt/ *noun*

هەویری شووشە(گەری) ۞ خمیر شیشە

**frit fly** *noun*

مێشی دەغل، مێشێکی وردی رەش کە کرمۆکەکەی بەلا و ئافەتێکی گرانە بۆ دەغل‌ودان و گەنمەشامی [*Oscinella frit*] ۞ نوعی مگس

**fritillary** /frɪ'tɪləri/ *noun, pl.* fritillaries

1 شلێر، گیایێ لە تیرەی lily، بە گولی زەنگولەئاساوە [*Fritillaria meleagris*] (snake's head) و جۆرە پێوەندی‌دارەکان] 2 جۆرێ پەپوولەی باڵقاوەیی و نارنجی [*Argynnis* و توخمەکانی تر: گەلێ جۆرن] ۞ 1 لالەی سرنگون 2 نوعی پروانە

**frittata** /frɪ'tɑ:tə/ *noun*

چێشتێکی ئیتالیایی، شێوەی omellete سپانیایی دەدا ۞ فریتاتا

**fritter** /frɪtə(r)/ *noun*

فریتێر (شتێ کە لە میوە، سەوزی و گۆشت، کەرە بەسەردا دەکرێ و چاک سوور دەکرێتەوە) ۞ پیراشکی

**fritto misto** /ˌfrɪtəʊ 'mɪstəʊ/ *noun*

(ئیتالیایی) جۆرێ چێشت ۞ نوعی غذا

**Fritz** /frɪts/ *noun*

(بریتانیا و نافەرمی) ئەلمانی و گەلی ئەلمانی،

ب.ت. سەربازێ لە شەڕی جیهانی یەکەمدا ◇ فرد آلمانی و مردم آلمان

**fritz** /frɪts/ *noun*, on the fritz
ناکاریگەر، بێباندۆر: *The TV is on the fritz again* ◇ غیرکارآمد

**frivolity** /frɪ'vɒləti, US -'vɑ:l-/ *noun, pl.* frivolities
بێئەقلی، سەرچلی، سووکی، گەوجی، گەمژەیی، بێهوودەیی: *I can't waste time on such frivolities* ◇ سبکسری، کم‌عقلی، حماقت

**frivolous** /'frɪvələs/ *adjective*
بێئەقل، کەم‌ئەقل، سووک، سەرچل، هەڵەشە، گەوجانە، بێهوودە، سەرسەرەکی، فشە، لەخۆڕایی، بێنرخ، بێبایەخ، هیچەکە (frivolously /'frɪvələslɪ/ *adv*: سەرچلانە؛ frivolousness *n*: سەرچلی، هەڵەشەیی، بێئەقلی) ◇ سبکسر، سربه‌هوا، سطحی، احمقانه، بیهوده، بی‌ارزش

**frizz** /frɪz/ *noun*
قژی لوول ◇ موی فرفری

**frizzante** /frɪt'zænteɪ, US -ti/ *adjective*
(مەی) نیمچەهەڵچوو، نیوەگازدار ◇ (شراب) نیم‌جوشان

**frizzed** *adjective*
لوول، فڕ ◇ فرفری

**frizzle** *noun*
قژی لوول یان فڕ (frizzly *adj*) ◇ موی فرفری

**frizzled** *adjective*
سوورەوەکراو، چزیلک، کسک ◇ جزغاله

**frizzy** *adjective* (frizzier, frizziest)
لوول، فڕ: *The rain made my hair go frizzy* ◊ *frizzy hair* ◇ فرفری

**fro** /frəʊ, US froʊ/ *adverb*, to and fro
پاش و پێش، لەم‌لاوە بۆ ئەولا ◇ جلو و عقب

**frock** /frɒk, US frɑ:k/ *noun*
1 کراس، کنج (ژنان) 2 عەبا، بالاپۆش (قەشەکان لەبەری دەکەن) 3 (کۆن) دەسەڵات یان پلەوپایەی قەشەیەتی (frocked *adj*؛ لە *froc* فەرەنسی کۆن، ئەڵمانی بنەڕەت) ◇ 1 پیراهن 2 قبا 3 قدرت یا مقام کشیشی

**frock-coat** *noun*, also frock- oat
فراک، کۆتی فراک، کەوای درێژ تا سەرچۆک (لەوەپێش بۆ ئاهەنگەکان لەبەر دەکرا) ◇ کت فراک

**froe** /frəʊ/ *noun*, also frow
ئامرازێکی دەسکدار شێوە پواز، بۆ داقلیشاندن ◇ فرو

**frog**[1] /frɒg, US frɔ:g, frɑ:g/ *noun*
1 بۆق، بەق، قربۆق [زۆر جۆرن، زۆربەیان لە خێزانی Ranidae] 2 (Frog, سووکانە) کەسێکی فەرەنسی، فەرەنسی چەپەڵ (بنەڕەت: *frogga* ئینگلیسی نیوەڕاست، ئەڵمانی بنەڕەت) ◇ 1 قورباغه، وزغ 2 فرانسوی کثیف

**frog**[2] /frɒg, US frɔ:g, frɑ:g/ *noun*
1 (ڕێی ئاسن) ڕەیلی چواررێیانە یان چوارڕایانە 2 قولاپ، گیرە (frogged *adj*؛ frogging *n*) ◇ 1 انشعاب 2 قلاب

**frog**[3] /frɒg, US frɔ:g, frɑ:g/ *noun*
قاپولکە، دەربەرێوی سێ‌سووچکەی بنی سمی ئەسپ ◇ فراگ

**frogbit** *noun*
قربۆق‌کوژ؟: گیایەکی سەرئاوی ئاوی شیرین بە هێشووە گەڵای خڕەوە [*Hydrocharis morsus-ranae* (ئوراسیا) و *Hydromystria laevigatum* (ئەمریکای باکووری)] ◇ فراگبیت، تخت قورباغه

**frogfish** *noun, pl.* same or frogfishes
جۆرێ ماسی کۆسە، بۆقەماسی [*Antennaria hispidus* (هیند و پاسیفیک) و جۆرەکانی تر] ◇ فراگفیش

**froggery** *noun, pl.* froggeries
1 دەستەی بۆقان 2 جێگای بۆقان ◇ 1 گروه قورباغه‌ها 2 جای غوکان

**froghopper** *noun*, also spipttlebug
جۆرێ bugی بازدەر یان قنەونی گیامژ، کرمۆکەکانی cuckoo spit بەرهەم دێنن [خێزان Cercopidae: زۆر جۆرن] ◇ فراگ‌هوپر

**frogman** /'frɒgmən, US 'frɔ:g-, 'frɑ:g-/ *noun, pl.* frogmen
مەلەوان، بۆقەپیاو، ناخەوان ◇ غواص

**frogmarch** /'frɒgmɑ:tʃ, US 'frɔ:gmɑ:rtʃ, 'frɑ:g-/ *noun*
قوربۆقەگیر، بۆقەبەند (هەڵگرتنی زیندانییێ بە شێوەیێ کە دوو کەس لاقی و دوو کەسی تر دەستی بگرن) ◇ فراگ‌مارچ

**frogmouth** *noun*
باڵندەیەکی شەوگەڕ، شێوەی nightjar دەدا [*Podargus strigoides* (هی زەردی قاوەیی، ئەوسترالیا) و جۆرەکانی تر] ◇ نوعی پرنده

**frog orchid** *noun*
(ڕووەکناسی) جۆرێ گیاسارمە، گیاسارمەبۆقە؟، هی ناوچە مامناوەندە باکوورییەکان [*Coeloglossum viride*] ◇ نوعی ثعلب

**frogspawn** /'frɒgspɔ:n, US 'frɔ:g-, 'frɑ:g-/ *noun*
گەرای بۆق، ڕەودەک، ماکێکی روونی دەلەمەئاسا ◇ تخم قورباغه

**frogwort** /'frɒgwɜ:t/ *noun*
(ڕووەکناسی) گیاسارمە ◇ ثعلب

**froideur** /frwʌ'dɜ:, French fʀwadœʀ/ *noun*
ساردوسڕی، خۆدوورگرتنی خەڵک (لێکتر) ◇ سردی

**frolic** /ˈfrɒlɪk, US ˈfrɑːl-/ *noun. adjective*
*n* شادی، خۆشی، بەکەیفی، شەیتانی، قۆشمەیی، شلوقی، هەڵبەز و دابەز، تەقڵەدەو، فرکوهۆڕ *adj* شاد، بەکەیف، قۆشمە ۞ *n* وجد، شادمانی، بازیگوشی، جست‌وخیز *adj* خوشحال، بازیگوش

**frolicsome** /ˈfrɒlɪksəm, US ˈfrɑːl-/ *adjective*
شەیتان، هاروهاج، دانەکەوتوو، بزۆز، شلوق، شاد، سەرخۆش، لەگوڕ، بەکەیف، خۆشحاڵ، بەدەماخ: *frolicsome lambs* ۞ بازیگوش، شاد

**frolicsomely** /ˈfrɒlɪksəmli, US ˈfrɑːl-/ *adverb*
بە خۆشی، بە شادی، سەرخۆشانە، بەدەماخانە ۞ با وجد

**frolicsomeness** /ˈfrɒlɪksəmnəs, US ˈfrɑːl-/ *noun*
خۆشی، شادی، خۆشحاڵی، بەدەماخ، بەگوڕی، لەگوڕی ۞ وجد

**from** /frəm, strong form frɒm, US frʌm, frɑːm/ *preposition*
1 لە، ژ 2 لە رووی 3 لە لایەن، لە کن، ژ ئالیێ، لەوەتای 4 لەو دەمەی، ماوە بە... 5 لە مەودای 6 لەبەرامبەر، لە هەمبەر 7 بەهۆی لەبەر، ژبەر، بەپێی، بە رەچاوکردنی، بە سەرنجدان بەو (شتە) ۞ 1 از 2 از روی 3 از طرف 4 از هنگام، مانند به... 5 در فاصله‌ی 6 در مقابل 7 به علت، مطابق، بنابر

**fromage blanc** /ˌfrɒmɑːʒ ˈblɒ̃, French fʀɔmaʒ blɑ̃/ *noun*
جۆرێ پەنیری نەرمی، پەنیرەسپی ۞ نوعی پنیر

**fromage frais** /ˌfrɒmɑːʒ ˈfreɪ, French fʀɔmaʒ fʀɛ/ *noun*
جۆرێ پەنیری نەرمی تازە، پەنیرەتازە ۞ نوعی پنیر

**frond** /frɒnd, US frɑːnd/ *noun*
(رووەکناسی) گەڵا (وەک هی خورما، سەرەخس fern و رووەکی لەو شێوەیە)، گەڵاخورما (fronded *adj* ؛frondage *n*) ۞ برگ، فلاخن

**frondescence** /frɒnˈdesəns/ *noun*
گەڵادەرکردن، گەڵاکردن ۞ برگ‌دادن

**frondescent** /frɒnˈdesənt/ *adjective*
گەڵادەرکەر، گەڵاکەر ۞ برگ‌دهنده

**frondose** *adjective*
پڕگەڵا، بەگەڵا، گەڵادار، گەڵاپڕ ۞ پربرگ

**front** /frʌnt/ *noun, adjective*
*n* 1 پێش، پێشەوە، بەردەم، بەرەوە، بەریان، بەشی پێشەوە، بەر، سەرەتا، دەسپێک 2 روو، ئاست 3 لەپ، بەر (دەست) 4 ریزی پێشەوە، ریزی هەوەڵ 5 (خانووبەرە) رووکار، لا، بەر (یکی خانووبەرە) 6 (رۆژنامە) لاپەرەی یەکەم 7 پێشەوەی جلوبەرگ 8 لێوار یان گوێی دەریا یان دەریاچە، گوێچەم، دەم رووبار، کەنار، رۆخ 9 ڕێگای کەناری یان دەم‌ئاو 10 شەقامی کەناری یان دەم‌ئاو 11 بەرە، ئەنی، ئەنی شەر، بەرەی شەر، پێشانی، هێڵی پێشەوەی بەرە 12 بەرەی هەوا 13 (ماشین) کورسی یان سەندەلی پێشەوە 14 مەڵبەند، بوار، ناقار، بواری چالاکی 15 رواڵەت، رووی دەرەوە *adj* 1 پێشەوە، بەری، سەرەتا، دەسپێک 2 (دیمەن) رووناک، رۆشن 3 (دەنگناسی) پێشەوە، پێشوو ۞ *n* 1 جلو، قسمت جلو، آغاز 2 رو، سطح 3 کف دست 4 صف مقدم 5 نما، ضلع 6 صفحه‌ی اول 7 جلوی لباس 8 لب دریا یا دریاچه 9 جاده‌ی ساحلی 10 خیابان ساحلی 11 جبهه، جبهه‌ی جنگ 12 جبهه‌ی هوا 13 صندلی جلو 14 حوزه، زمینه 15 ظاهر *adj* 1 جلو، نخست 2 واضح 3 (آواشناسی) پیشین

**frontage** /ˈfrʌntɪdʒ/ *noun*
1 (خانووبەرە) لا، بەر، رووکار، پانایی پێشەوەی خانووبەرە، پێشەخانوو، لای پێشەوەی خانوو: *the baroque frontage of Milan Cathedral* ◊ *The building's street frontages are mostly of glass* 2 روو 3 دیمەن 4 گوێ، پاڵ، کەنار، دەم ۞ 1 ضلع، نما 2 رو 3 منظره 4 کنار

**frontage road** = service road

**frontal** /ˈfrʌntl/ *adjective, noun*
*adj* 1 پێشینە، لە پێشەوە، لە بەرەوە، پێشوەیی: *Airbags protect the driver in the event of a severe frontal impact* 2 بەرەیی، سەربە بەرە (هەوا): *a cold frontal system* 3 سەربە ناوچاوان، تەوێڵی: *the frontal lobes of the brain* *n* 1 ئێسکی ناوچاوان یان تەوێڵ 2 پەردەی پێش مەحراب ۞ *adj* 1 جلوی 2 جبهه‌ای 3 وابسته به پیشانی *n* 1 استخوان پیشانی 2 پرده‌ی جلو محراب

**frontal bone** *noun*
ئێسکی پێشەوەی سەر یان ناوچاوان ۞ استخوان پیشانی

**frontally** /ˈfrʌnttəli/ *adverb*
لە پێشەوە، بەرەیی‌یانە ۞ به طور جلوی یا جبهه‌ای

**frontal system** *noun*
رێکخستە یان سیستمی بەرەیی (هەوا) ۞ سیستم جبهه‌ای

**front and center** *noun*
بەرە و ناوەند، ئەنی و ناوەند (شوێنێکی زۆر گرنگ کە سەرنج رادەکێشێ): *The issue has moved front and center in his presidential campaign* ۞ جبهه و مرکز

**the front-bench** *noun*
(پارلەمانی بریتانیا) پێش‌نشینان، ئەندامە گرنگەکانی حکومەت یان رکەبەر: *an*

*Opposition front-bench spokesman on defence* ۞ اعضا مهم دولت یا اپوزیسیون

**the front-bench** *adjective*
سەربە حکومەت یا پارتی بەرهەڵستکار ۞ وابسته به دولت یا اپوزیسیون

**front-bencher** /ˌfrʌntˈbentʃə(r)/ *noun*
پێشنشین، بەرنشین، ئەندامی پارلەمان (لە پارلەمانی بریتانیادا) ۞ فرانتبنچر

**front cover** *noun*
رووبەرگ ۞ روی جلد

**front desk** *noun*
میزی پێشەوە ۞ میز جلویی

**front door** *noun*
درگای چوونەژوورەوە، درگای سەرەکی، درگای پێشەوە ۞ در اصلی

**front-end** *adjective*
1 پێشەوەیی، سەربە بەشی پێشەوە، ب.ت. ماشێن 2 (نافەرمی، پارە) هەر لە سەرەتای سەوداوە دراوە ۞ 1 وابسته به قسمت جلو 2 فرانتایند

**frontier** /ˈfrʌntɪə(r), US frʌnˈtɪr/ *noun, adjective*
*n* 1 سنوور، تخوب، سەرحەد 2 (خوازە) سنوور، سەرحەد، رادە 3 (frontiers) سنوورەکان 4 (زانست) دوا دۆزراوەکان *adj* سەرسنوور، تخوبی (frontierless *adj*) ۞ *n* 1 مرز 2 (مجازی) مرز 3 (در جمع) مرزها 4 آخرین یافتەها *adj* مرزی

**frontiersman** /ˈfrʌntɪərzmən, US frʌnˈtɪrz-/ *noun*, also frontierswoman, *pl.* frontiersmen or frontierswomen
دانیشتووی سەرسنوور، سنوورنشین ۞ مرزنشین

**frontispiece** /ˈfrʌntɪspiːs/ *noun*
1 پێشوێنە، وێنەی سەرەتای کتێب (لە بەرامبەر لاپەڕەی ناوی کتێب) 2 (بیناسازی) روو یان رووکاری سەرەکی خانوویێ 3 ژوورگە یان سەردەرانەی نەخشێنراو 4 سێگۆشە pediment ی ژوور درگا یان پەنجێرە، سەردەرانە، سەرپەنجێرانە ۞ 1 تصویر نخست کتاب 2 (معماری) نمای اصلی ساختمان 3 و 4 فرانتیاسپیس

**frontlet** /ˈfrʌntlɪt/ *noun*
1 پەردەی جوانی (لە میحراب) 2 بەرچاوکە، زرێ و... بۆ ناوچاوانی گیانەوەرێ 2 = phylactery ۞ 1 فرانتلت 2 پیشانیبند

**front line** *noun*
1 هێڵی پێشەوەی بەرەی شەڕ، هێڵی ئاگر 2 هێڵی پێشەوە، ریزی پێشەوە ۞ 1 خط مقدم جبهه 2 خط مقدم

**frontman** /ˈfrʌntmæn/ *noun, pl.* frontmen
1 ریبەر، سەرکردە، سەرۆک 2 پێشکەشکار، بەڕێوەبەر (تەلەفزیۆن یان بەرنامەی رادیۆیی) ۞ 1 رهبر 2 مجری

**front office** *noun*
*the front-office* : 1 بەڕێوەبەران، کارگێڕان 2 نووسینگەی سەرەکی، سەرنووسینگە، *staff* نووسینگەی راپەڕاندن یان جێبەجێکردن ۞ 1 مدیران 2 دفتر اصلی، دفتر اجرایی

**front-of-house** *noun*
شوێنی لە شانۆدا کە لایەن بینەرانەوە بەکاری دێت، شوێنی گشتی لە شانۆ و هوتێلدا: *There was an expectant atmosphere front-of-house* ۞ فرانت اف هاوس

**fronton** /ˈfrʌnt(ə)n/ = pediment1

**front-page** *noun*
لاپەڕەی سەرەتا، پێشپەڕ، سەرپەڕ، یەکەم لاپەڕە (رۆژنامە): *The story was on the – nt-pages of all the tabloids* ۞ صفحهی اول

**front rank** *noun*
ریزی پێشەوە ۞ صف مقدم

**front room** *noun*
دیوی نیشتمان، دیوی ژیوار(تیاکردن)، ژووری پێشەوە ۞ اتاق نشیمن

**front-runner** *noun*
پێشەنگ، سەرکێش، سەرجەلە: *He is one of the –t-runners in the presidential election* ◊ *a political front-runner* ۞ پیشتاز

**frontsman** /ˈfrʌntsmən/ *noun, pl.* frontsmen
دەسفرۆش، فرۆشیار (لەبەر دووکانا) ۞ فروشنده

**frontstall** /ˈfrʌntstɔːl/ *noun*
زرێی سەری ئەسپ، سەرەوانەی ئەسپ ۞ زره سر اسب

**frontward** /ˈfrʌntwəd/ *adjective, adverb*
پێشەوە ۞ جلوی

**frontwards** *adjective*
بەرەو پێشەوە ۞ به سوی جلو

**frost** /frɒst, US frɔːst/ *noun*
1 سەهۆڵبەندان، بەستەڵەک، شەختەبەندان، قۆناخی سەهۆڵبەندان، سەردەمی بەستەڵەک 2 سەهۆڵ 3 زوقم، ئەڵماسە، سیخوار، قەل، شەڵتە، خووس، خویز، ئاڵشت، زەمەگولیلک، سووخ 4 شەختەبەند، جەبەرە، تۆفوبەند، نەختە، سەرمای توند یان سەغلەت 5 بنەوەی سیفر، ژێر سیفر 6 (زمانی خەڵک) بەزین، تێشکان ( frostless *adj* بنەڕەت: *forst* ئینگلیسی کۆن، *frost* ئەڵمانی بنەڕەت) ۞ 1 یخبندان، دورهی یخبندان 2 یخ 3 بَشم 4 سرمای شدید 5 زیر صفر 6 شکست

**frostbite** /ˈfrɒstbaɪt, US ˈfrɔːst-/ *noun*
سەرمابردوویی، سەرمابردن، سەرمالێدان، تەزیوی، سڕی؛ هەروەها زیان گەیشتن بەو شانانە کە سەرما لەی داوە یان تەزیوە: *The climbers were all suffering from -tbite* ۞ سرمازدگی

**frostbitten** /ˈfrɒstbɪtn, US ˈfrɔːst-/ *adjective*

سەرمابردوو، تەزیو، سر، کەسیرە(کەوتوو) ◊ سرمازده

**frostbound** *adjective*

بەستوو، شەختەبەند، بەسەهۆڵبوو، سەهۆڵبەند، سەهۆڵداگرتوو ◊ یخزده

**frosted** /'frɒstɪd, US 'frɔ:stɪd/ *adjective*

1 (شووشە) تەڵخ، تاریک 2 سەهۆڵپێوەبوو، سەهۆڵپۆش، سەهۆڵاوی 3 بەستوو، شەختەبەند، سەهۆڵبەند، شەختاوی: *the frosted garden* ◊ 1 تار 2 پوشیده از یخ 3 یخزده

**frosted glass** *noun*

شووشەی تاریک یان تەڵخ، شووشەی نەبینا ◊ شیشەی مات

**frost heave** *noun*

قوتبوونەوەی زەوی یا تاشتی بەهۆی بەستەڵەکەوە ◊ فراستهیو

**frosting** = icing

**frost-nail** *noun*

سنگ یان بزماری سەهۆڵبڕ ◊ میخ یخشکن

**frosty** /'frɒsti, US 'frɔ:sti/ *adjective* (frostier, frostiest)

1 زۆر سارد، ساردوسڕ (لە ڕەفتاردا) 2 بەستوو، شەختەبەند، سەهۆڵبەند، freezing، داپۆشراو لە زوقم (frostily /'frɒstɪli/ *adv*: بە ساردییەوە؛ frostiness *n*: ساردی، ساردوسڕی) ◊ 1 بسیار سرد 2 یخزده

**froth** /frɒθ, US frɔ:θ/ *noun*

1 کەف، سەرکەف، سەرکوڵ 2 فلتە، قسەی هیچەکە، یاوە، هەڵیتوپڵیت (بنەڕەت: لە *frotha* نۆرسی کۆن) *frauth* ◊ 1 کف 2 لاطائل، یاوه

**frothing** *adjective*

کەفاوی، کەفدار ◊ کفآلود

**frothy** /'frɒθi, US 'frɔ:θi/ *adjective* (frothier, frothiest)

1 کەفاوی، کەفپۆش، کەفکردوو، لەکەفەوەدراو 2 سووک، هیچ، بێبایەخ، فشە، ئایەخ، بێواتا (frothily *adv*: هیچانە، بێبایەخانە، سەرسەرەکییانە؛ frothiness /'frɒθinəs, US 'frɔ:θinəs/ *n*: 1 بێهوودەیی، هیچی، سووکی 2 کەفاویبوون) ◊ 1 کفکرده، کفآلود 2 مبتذل

**frottage** /'frɒtɑ:ʒ/ *noun*

(فەرەنسی) شێوازی هەڵگرتنەوە بە پیاهێنان و خشاندنی بەسەر ئاستێکا بۆ دارشتنی بنچینەی کاریکی هونەری (frotteur *n*) ◊ فروتاژ

**frottola** /'frɒtələ/ *noun, pl.* frottole /-leɪ/

(موسیقا) جۆرێ گۆرانی دڵدارانە یان پێکەنینی ئیتالیایی، ب.ت. لە سەدەکانی 15 و 16 دا ◊ فروتولا

**frou-frou** /'fru:fru:/ *noun*

1 خشەخش، خشوهۆڕ (هی لیکخشانی جل لە رۆیشتندا) 2 چین، ب.ت. هی جلی ژنان ◊ 1 خشخش 2 چین

**froward** /'frəʊəd/ *adjective*

(کۆن) سەربزێو، یاغی، سەرچەوت، سەرەڕۆ ◊ سرکش، متمرد، عنید

**frowardly** /'frəʊədli/ *adverb*

سەربزێوانە، یاغییانە، سەرەڕۆیانە، سەرچەوتانە ◊ با سرکشی

**frowardness** /'frəʊədnəs/ *noun*

سەربزێوی، یاغیگەری، ئیناد، سەرەڕۆیی، ئیناد ◊ سرکشی، عناد، تمرد

**frown** /fraʊn/ *noun*

1 گرژی، رووتاڵی، رووگرژی، مۆنبوونەوە، مۆربوونەوە، رووترشی، ناوچەوانگرژی: *A small -n creased her forehead* ◊ *She looked up with a puzzled -n on her face* 2 گنجی ناوچاوان، چرچی ناوچاوان 3 پێنخۆشنەبوون ◊ 1 اخم، ترشرویی 2 خط پیشانی 3 ناخرسندی

**frowning** *adjective*

مۆر، ناوچاوانگرژ، رووگرژ، رووتاڵ، رووناخۆش، مۆن، مرومۆچ ◊ اخمو، ترشرو

**frowningly** /fraʊnɪŋli/ *adverb*

رووگرژانە، بە مۆرەوە، بە گرژییەوە ◊ با اخم

**frowst** /fraʊst/ *noun*

هەوای گنخاو، بۆخاو، هەوای پیس، هەفار، بۆهەڕنەمووت، بۆسار، هەوای بۆگەن ◊ هوای دمکرده، بوی نا

**frowsty** /'fraʊsti/ *adjective* (frowstier, frowstiest)

(هەوا) بۆخاو، گنخاو، بۆهەفار، پیس، بۆسار، کۆن، ناخۆش، بۆگەن، musty (کۆڕاوی) (frowzy: *a small frowsty office* ◊ دمکرده

**frowzily** /fraʊzɪli/ *adverb*

شپرزانە، بە پنجڵی ◊ با شلختگی

**frowziness** /fraʊzinəs/ *noun*

1 شپرزەیی، پنجڵی، شڵوخی، شپرێوی، بێسەروبەری 2 بۆگەنی ◊ 1 شلختگی 2 تعفن

**frowzy** /fraʊzi/ *adjective* (frowzier, frowziest), also frowsy

1 شپرزە، شروشپرزە، پنجڵ، ناخاوێن 2 بۆگەن، ترشاو، رزیو، بۆسار 3 پیس، ناخۆش ◊ 1 شلخته 2 بدبو، ترشیده 3 کثیف

**froze** /frəʊz, US froʊz/ = past of freeze

**frozen**[1] /'frəʊzn, US 'froʊzn/ *adjective*

1 بەستوو، رەقهەڵاتوو، شەختەبەند، سەهۆڵاوی، جەبەرەبەند، زۆرسارد: *frozen peas* ◊ *I'm absolutely frozen!* 2 (دارایی، حساب و هتد) بەستراو ◊ 1 یخزده، بسیار سرد، منجمد 2 مسدودشده

**frozen**[2] /'frəʊzn, US 'froʊzn/ = past participle of freeze

**frozen shoulder** *noun*
ڕەقبوونی بەژانی درێژماوەی جومگەی شان، شانەڕەقێ ◌ فروزن شولدر

**FRS** *abbreviation* Fellow of the Royal Society
ئەندامی کۆمەڵەی پاتشایی ◌ عضو انجمن سلطنتی

**fructiferous** /frʌkˈtɪfərəs/ *adjective*
بەبەرهەم، بەبەر، پڕبەر، پڕمیوە، بەپیت، بەبرشت، بەردار، بەرهێنەر ◌ حاصل‌خیز، بارده

**fructification** /ˌfrʌktəfəˈkeɪʃn/ *noun*
1 بەرهێنەری، بەرهێنان، بەرگرتن، بەرهەمدان، بەبەرهەمی، بەپیتی، بەبەری، پڕبەری 2 میوە، بەر، بەرهەم ◌ 1 باردهی، حاصل‌خیزی 2 ثمر

**fructose** /ˈfrʌktəʊs, -təʊz, US -toʊs, -toʊz/ *noun*
(کیمیا) شەکری میوە، فرۆکتۆز (تێکەڵەی شەکری میوە) $C_6H_{12}O_6$: شەکرێکی پۆلی hexose ب.ت. لە هەنگوین و میوەدا دۆزراوەتەوە (بنەڕەت: لە *fructus* لاتین + -ose[2]) ◌ فروکتوز

**fructuous** /ˈfrʌktjʊəs/ *adjective*
1 بەبەرهەم، بەبەر، پڕبەر، پڕمیوە، بەردار، بەرهێنەر 2 بەسوود، بەقازانج، بەکەڵک، بەکارهاتوو ◌ 1 میوەدار 2 سودمند

**frug** *noun*
سەمای کرژی موسیقای پاپ، باو لە نیوەڕاستی شەستەکاندا ◌ فراگ

**frugal** /ˈfruːgl/ *adjective*
1 دەس‌پێوەگر، دەس‌گیرۆ، کەم‌خەرج، دەس‌پێوەگرانە: *2 a frugal existence/life* (نان) کەم، هەرزان، سادە: *a frugal lunch of* 1 ◌ (frugalness *n*) *bread and cheese* صرفه‌جو، مقتصدانه 2 مختصر

**frugality** /fruˈgæləti/ *noun*
دەس‌پێوەگری، دەس‌گیرۆیی، کەم‌خەرجی ◌ صرفه‌جویی

**frugally** / fruˈgəli/ *adverb*
دەس‌پێوەگرانە: ◌ *to live/eat frugally* مقتصدانه

**frugivore** /ˈfruːdʒɪvɔː/ *noun*
(گیانەوەرناسی) گیانەوەری میوەخۆر ◌ جانور میوه‌خوار

**frugivorous** /ˈfruːˈdʒɪvərəs/ *adjective*
میوەخۆر ◌ میوه‌خوار

**fruit** /fruːt/ *noun*
1 میوە، فێقی، خوزار، یەمیش، فێکی، بار، بەر، بەرهەم 2 ئەنجام، ئاکام، پێشاژۆ 3 بەرهەم، بەروبۆ 4 (fruits) بەروبەرهەم، ئەنجامەکان 5 گژوگیای بۆ خواردن، ڕووەکە خۆراکییەکان (وشکە: dried fruits) ◌ 1 میوه، ثمر 2 نتیجه 3 فراورده، محصول 4 ثمرات، نتایج 5 رستنی‌های خوردنی

**fruitage** /ˈfruːtɪdʒ/ *noun*
1 بەرهێنان، بەرگرتن، بەرهێنەری 2 ئەنجام، ئاکام 3 بەرهەم، بەر 4 (کۆن) منداڵ، فرزەند، منداڵ 5 بەچکە، بێچوو (گیانەوەر) 6 (نافەرمی، سووکانە) پیاوی هاوڕەگەزباز ◌ 1 میوه‌آوری 2 نتیجه 3 حاصل 4 فرزند 5 بچه‌ها (جانور) 6 مرد هم‌جنس‌باز

**fruitarian** /fruːˈteərɪən/ *noun*
مرۆڤی میوەخۆر، بەرخۆر (کە تەنیا میوە دەخوا) ◌ آدم میوه‌خوار

**fruitarianism** *noun*
میوەخۆری، بەرخۆری ◌ میوه‌خواری

**fruit bat** *noun*
شەمشەمەکوێرەی میوەخۆر [خێزانی Pteropodidae: چەندین جۆرن] ◌ خفاش میوه‌خوار

**fruit body** = fruiting body

**fruitcake** *noun*
1 کەیکی میوە 2 مرۆڤی ڕەفتارسەیر یا شێت ◌ 1 کیک میوه 2 فروت‌کیک

**fruit cocktail** *noun*
کوکتێلی میوە ◌ کوکتل میوه

**fruit cup** *noun*
1 سالادی میوە 2 جۆرێ خواردنەوەی تێکەڵاوی میوە ◌ 1 سالاد میوه 2 فروت کاپ

**fruit drop** *noun*
میوەی نەگەیوی وەریوی دارێ ◌ فروت دراپ

**fruiterer** /ˈfruːtərə(r)/ *noun*
میوەفرۆش ◌ میوه‌فروش

**fruitery** /ˈfruːtəri/ *noun, pl.* fruiteries
میوەفرۆش ◌ میوه‌فروش

**fruit fly** *noun*
مێشی میوە [خێزانەکانی Drosophilidae و Tephritidae: زۆر جۆرن] ◌ پشه‌ی میوه

**fruitful** /ˈfruːtfl/ *adjective*
1 بەبەر، پڕبەر، بەبرشت، بەردار، ئاودان (دار) fertile 2 بەبرشت، بەپیت، مایەدار 3 بەسوود، بەبەهرە، بەقازانج، بەکارهاتوو، کاریگەر، بەبەرهەم، بەئەنجام، سەرکەوتووانە productive: *a fruitful discussion* ◌ 1 مثمرثمر، پرثمر، باردار 2 حاصل‌خیز 3 مفید، موفقیت‌آمیز

**fruitfully** /ˈfruːtfəli/ *adverb*
بە قازانجانە، بەسوودانە، کاریگەرانە ◌ به طور مفید، مؤثرانه

**fruitfulness** /ˈfruːtfəlnəs/ *noun*
1 بەبەری، بەرداری، پڕبەری، بەبەرهەمی 2 بەبرشتی، بەپیتی، مایەداری 3 بەسوودی، بەقازانجی، بەکەڵکی، بەکارهاتوویی ◌ 1 پرثمری 2 حاصل‌خیزی 3 مفیدبودن

**fruiting body** *noun*
(ڕووەکناسی) ئەندامی بەرهەمهێنەری سپۆر یان

تۆوی کەڕوویی، تۆودان، ب.ت. sporophore
◌ عضو هاگ‌آور قارچ

**fruition** /fru'ɪʃn/ *noun*

1 ئەنجام، ئاکام، پێشازۆ، بەرگرتن، بەرهێنەری، پڕبەری، بەرهێنان 2 جێبەجێبوون، بەدیهاتن ◌ 1 ثمر، نتیجه، میوه‌آوری 2 تحقق

**fruit knife** *noun*

کاردی میوەخۆری ◌ کارد میوه‌خوری

**fruitless** /'fru:tləs/ *adjective*

1 بێبەر، بێمیوە، بێبەرهەم 2 بێئەنجام، بێبەرەو، بێهوودە، نەزۆک (fruitlessly /'fru:tləsli/ *adv*: بێبەرانە، بێبەرهەمانە، بێئەنجامانە؛ fruitlessness /'fru:tləsnəs/ *n*) ◌ 1 بی‌ثمر 2 عقیم، عبث

**fruitlet** /'fru:tilt/ *adjective*

1 میوەلە، بەرۆکە، وردەبەر، بەر یان میوەی ورد 2 (ڕووەکناسی) وشەیێکی تر بۆ drupel ◌ 1 میوه‌ی کوچک، ثمر کوچک 2 فروتلیت

**fruit machine** *noun*

دەزگای کۆینی قومار ◌ جک‌پات

**fruit salad** *noun*

سالادی میوە ◌ سالاد میوه

**fruit salt** *noun*

خوێی میوە ◌ جوهر میوه

**fruit shop** *noun*

(دووکانی) میوەفرۆشی ◌ میوه‌فروشی

**fruit sugar** /'fru:t ʃʊgə(r)/ = fructose

**fruity** /'fru:ti/ *adjective* (fruitier, fruitiest)

1 میوەئاسا، میوەیی، میوەتیابوو، بە تامی میوەوە 2 (شۆخی، چیرۆک و هتد) هەرزە، ناحەز، ناشیرین، پیس 3 (پێکەنین) لە قوولایی دڵەوە، لە دڵەوە 4 کاریگەر 5 (زۆرتر لە ئەمریکا و نافەرمی) شێت 6 (دەنگ) بەسۆز، نەرم، بلاوێن، گەرم ◌ 1 میوه‌مانند، دارای میوه، با طعم میوه 2 مبتذل 3 از ته دل 4 مؤثر 5 دیوانه 6 خوش‌آهنگ

**frumentaceous** /fru:mən'tɪʃəs/ *adjective*

گەنمی، پێوەندی بە گەنمەوە هەیە ◌ وابسته به گندم

**frumenty** /'fru:m(ə)nti/ *noun*, also furmety

جۆری چێشتی کۆن کە بریتییە لە گەنمی تویخ‌لێوەکراوی کولاو لەگەڵ شیر، شەکر و دارچین ◌ نوعی غذای قدیمی

**frump** /frʌmp/ *noun*

(ب.ت. ژن) کەسێکی کۆنەپارێز، مرۆی کۆنپۆش، مرۆی شرەپۆش، کەسێکی پنجل ◌ زن امل یا بدلباس

**frumpish** /'frʌmpɪʃ/ *adjective*

کۆنپۆش، کۆنەپارێز، کۆنەپەرست (frumpishly *adv*) ◌ بدلباس، امّلی

**frumpy** *adjective* (frumpier, frumpiest)

شروشبرزە، پنجل (frumpily *adv*؛ frumpiness *n*) ◌ شلخته

**frusemide** /'fru:səmʌɪd/ *noun*, chiefly US also furosemide

(پزشکی) ئاوێتەیێکی دەسکرد یان سینتێتیک زۆر diuretic، ب.ت. بۆ چارەسەری ئاوبەند oedema بەکاردێنرێ ◌ فروسمید

**frustrated** /frʌ'streɪtɪd, US 'frʌstreɪtɪd/ *adjective*

1 تێشکاو، سەرنەکەوتوو، خەفەکراو، کپکراو، کێنراو، دامرکاو، دامراو، سەرنەگرتوو، نامراد، داماو، بێئەنجام(ماو)، سەرکوێر، ناهومێد، دڵسارد، باڵشکاو، دەسشکاو 2 ناقایل، نارازی (لەباری سێکسییەوە) ◌ 1 ناکام، شکست‌خورده، بی‌نتیجه، سرخورده 2 ناخشنود

**frustrating** /frʌ'streɪtɪŋ, US 'frʌstreɪtɪŋ/ *adjective*

دڵساردکەرەوە، ناهومێدکەر، هیوابڕ، دامرکێنەر، دامڕێتەر، دەسشکێنەر، بەئێش، بەژان، نارەحەتکەر، دڵشکێن، ڕقهەستێن، وەڕەسکەر (frustratingly *adv*) ◌ مأیوس‌کننده، عذاب‌آور، عصبانی‌کننده

**frustration** /frʌ'streɪʃn/ *noun*

1 تێشکان، سەرنەکەوتوویی، نامرادی، خەفەکراوی، کپکراوی، دامرکاوی، دامراوی، ناهومێدی، دڵساردی، سەرکوێری، بێهیوایی، دەسشکاوی، داماوی، بێدەسەڵاتی، بەیدەسی: ◊ *Dave thumped the table in frustration* پووچەڵ کردنەوە، 2 *sexual frustration* لەکارخستن، نەزۆکاندن، لە کاریگەری خستن 3 بێبەشی، بێبەری 4 ناقایلی، پێخۆشنەبوون، نارەزایەتی 5 ڕقهەستاوی، نارەحەتی ◌ 1 شکست، ناکامی، نومیدی، عجز، سرخوردگی 2 عقیم‌گذاری 3 محرومیت 4 ناخشنودی، ناخرسندی 5 عصبانیت

**frustule** /'frʌstju:l/ *noun*

پارچەلە، پارژە: سەدەف یان لەپکەی دیاتۆمی؛ سەدەف و پرۆتۆپلازمی یەک‌دیاتۆمە؛ سەدەف یان قاپێلکی سیلیسی دوولەپکەیی 2-valved دیاتۆمی (بنەڕەت: لە *frustulum* لاتین، چکۆلێنراوی *frustum*) ◌ فروستیول

**frustum** /'frʌstəm/ *noun, pl.* frusta /-tə/ or frustums

قووچەکی نیوەچڵ، قووچەکی ناتەواو (بنەڕەت: لاتین "piece") ◌ مخروط ناقص

**frutescent** *adjective*, compare crustose, foliose

دەوەنی، دەوەنانە، دەوەن‌ئاسا، دارۆچکەیی (frutescence *n*) ◌ بوته‌مانند

**fruticose** /'fru:tɪkəʊz, US -s/ *adjective*

دەوەنی، سەربە دەوەن: *fruticose lichens* ◌

**garrison state** *noun*
دەوڵەتی سەربازی یان میلیتاری، هەرێمی میلیتاری ◌ دولت نظامی
**garrison town** *noun*
لەشکرنشین (هەروەها military centre) ◌ گاریسون تاون
**garron** /'garən/ *noun*
ئەسپێکی چکۆلەی نژاد ئیرلەندی و سکاتلەندی ◌ گارون
**garrotte** /gə'rɒt, US gə'rɑ:t/ *noun*, also garotte, US garrote
کوشتن بە تەنگکردنەوەی تەوقی مل، شتی پێخنکاندن، تێل، تەناف، پەت ◌ گاروت، سیم، طناب
**garrotter** *noun*
خنکێنەر (بە پەت یان تێل یان وایەر) ◌ گاروتر
**garrulous** /'gærələs, US -rjʊl-/ *adjective*
زۆربلە، چەنەدرێژ، چەنەباز، چەقەسرۆ، زۆروەڕ، چەنەهەراش، لەوچە، سازنگە ( garrulity /gə'ru:lɪti/ or garrulousness *n*: زۆربلەیی، چەنەدرێژی، چەنابازی، چەقەسرۆیی، زۆروەڕی، چەنەهەراشی؛ garrulously /'gærələsli, US -rjʊl-/ *adv*: زۆروەڕانە، چەنەوەرانە) ◌ وراج، پرحرف
**garter** /'gɑ:tə(r), US 'gɑ:rt-/ *noun*
کەژی گۆرەوی، بەستی گۆروا ◌ بند جوراب
**the Garter** /'gɑ:tə(r), US 'gɑ:rt-/ *noun*
گارتیر: بەرزترین پلەوپایە یا پۆستی سوارچاکێتی لە ئینگلتەرە ◌ گارتر
**garter belt** = suspender belt
**garter snake** *noun*
1 ماری بێژاری ڕێرێی ئەمریکایی، ماری گارتیر [*Thamnophis sirtalis*] و جۆرە پێوەندیدارەکان] 2 جۆرێ ماری رەهۆڵکەنی ژاراوی [توخم *Elapsoidea*] ◌ مار گارتر
**garth** /gɑ:θ/ *noun*
1 باخچە، حەوشە، حەسار 2 بەنداوی راوەماسی 3 دەوربەندان ◌ 1 باغچە، حیاط 2 سد ماهی‌گیری 3 محوطه
**gas** /gæs/ *noun, pl.* gases or gasses
1 گاز 2 هەڵم 3 (چێشتلێنان) گاز 4 گڕ 5 گازی بێهۆشکەر، گازی سڕکەر 6 گازی ژاراوی 7 (لەئەمریکا) بێنزین، بەنزین petrol 8 قسەی قۆڕ، فلتە، لاف 9 باوێژ، ترۆتس، بای ناوزگ ◌ 1 گاز 2 بخار 3 اجاز گاز 4 شعله 5 گاز هوش‌بر 6 گاز سمی 7 بنزین 8 چرند، لاف 9 گاز معده
**gas analyzer** *noun*
گازشیکەرە، گازشیکەرەوە، شیکەرەوەی گاز ◌ تحلیل‌گر گاز
**gasbag** /'gæsbæg/ *noun*
مرۆی چەنەوەر، چەنەهەراش ◌ آدم پرحرف
**gas bracket** /'gæsbrækɪt/ *noun*
چرای گازی دیواری، گڵۆپی گازی بە دیوارەوە ◌ چراغ گازی دیواری
**gas burner** /'gæs bɜ:nə(r)/ *noun*
گاز ◌ اجاق گازسوز
**gas chamber** *noun*
ژووری گاز (دیوێ پڕ لە گاز، بۆ کوشتنی مرۆڤ و گیانەوەران) ◌ اتاق گاز
**gas-coal** /'gæs kəʊl/ *noun*
خەڵووزی گازدار یا گازاوی ◌ زغال‌سنگ گازدار
**Gascon** /'gask(ə)n/ *noun*
1 خەڵکی گاسکۆنی، ناوچەیێ لە باشووری رۆژاوای فەرەنسە 2 (گسۆن gascon) مرۆێ خۆهەڵکێش و بەلاف ◌ 1 گاسکون 2 آدم لاف‌زن
**gasconade** /,gaskə'neɪd/ *noun*
خوهەڵکێشان، فڕوفیشاڵ، لاف، هاڕەوگێفە ◌ لافزنی
**gas constant** *noun*
(کیمیا) جێگیری گاز ◌ ثابت گاز
**gas-cooled** *adjective*
(ریاکتۆری ناوکی) گازفێنککەرەوە، کە بە گاز وشک دەبێتەوە، بە یان خاوەنی فێنککەرەوەی گازی ◌ دارای خنک‌کننده‌ی گازی
**gas cooker** *noun*
گاز، سۆپای گاز (چێشتلێنان) ◌ اجاق گاز
**gas cylinder** *noun*
لوولەکی گاز، کەپسوولی گاز، سیلەندری گاز ◌ کپسول گاز
**gas engine** /'gæs endʒɪn/ *noun*
بزوێنە یان مۆتۆری گازی ◌ موتور گازی
**gaseous** /'gæsiəs, US 'geɪsiəs/ *adjective*
*a gaseous mixture*: گازی، گازئاسا، شێوەگاز ◌ گازی، گازمانند
**gaseousness** /'gæsiəsnəs, US 'geɪsiəsnəs/ *noun*
گازیبوون، گازئاسایی، شێوەگازی ◌ گازمانندی
**gas equation** *noun*
(کیمیا) هاوکێشەی گاز ◌ معادله‌ی گاز
**gas fire** *noun*
کوورەی گازی ◌ بخاری گازی
**gas-fired** *adjective*
گازی، بەگازسووتاو، بەگازکارکردوو ◌ گازسوز
**gas fitter** *noun*
گازدابەست، وەستاکاری گاز، لوولەکێشی گاز ◌ تعمیرکار گاز
**gas fittings** /'gæs fɪtɪŋz/ *noun*
گازدابەستی، دابەستنی دەزگا و لوولە و پارچەکانی تر بۆ گەرمکردن و رۆشنکردن بە گاز، دابەستنی کەلوپەلی گازی ◌ اتصالات وسایل گازسوز
**gas-guzzler** *noun*

(ماشین، نافەرمی) بێنزینهەڵلوش، بێنزینبەرگەنەگر، خۆرەی بێنزین (gas-guzzling *n*: بێنزینهەڵلوشی، بێنزینبەرگەنەگری) ◌ گازگازلر

**gash**[1] /gæʃ/ *noun*
1 برینی قووڵ (ب.ت. لە پێستی مرۆڤ)، جێگای برین، گرێ: *He gashed his hand on a sharp piece of rock* 2 چاڵ یان کونێکی قووڵ یان باریک: *cut a gash through the forest ◊ a gash in the hull ◊ The explosion left a wide gash in the rock* ◌ 1 زخم عمیق، جای زخم 2 تورفتگی عمیق یا باریک

**gash**[2] /gæʃ/ *noun*
(بریتانیا و نافەرمی) پاشەرۆ، پاشماوە، خشتوخاڵ، گەنوگوو(زاڵ) ◌ آشغال

**gas heater** *noun*
کوورەی گازی ◌ بخاری گازی

**gas holder** 'gæshəʊldə(r), US -hoʊl-/ = gasometer

**gasification** /gæsəfɪ'keɪʃn/ *noun*
گازاندن، بەگازکردن، کردنەگاز، گازین ◌ تبدیل به گاز، گازیفیکاسیون

**gasiform** /'gæsəfɔ:m/ = gaseous

**gasket** /'gæskɪt/ *noun*
1 بەرپێچ، درزگیرە، درزگر، درزبێن، درزبەند، واشەر 2 بادەوەبەست، بایەوانبێن، بادەوەبەند، چارۆکەبەست، چارۆکەبەند ◌ 1 واشر 2 شراع‌بند

**gaskin** /'gaskɪn/ *noun*
رانی لاق یان دواوەی ئەسپ، رانی پێ یان پاشوو ◌ ران عقب اسب

**gas laws** *noun, pl.*
قانوونەکانی گاز، زاکوونە گازییەکان ◌ قوانین گاز

**gaslight** /'gæslaɪt/ *noun*
1 شەوق یان رۆشنایی گاز: *In the gaslight she looked paler than ever* 2 چرا یان گلۆپی گازی، چراگاز (gas-lit *adj*: بە شەوقی گاز رۆشنەوەبوو، رووناک لەبەر شەوقی گاز) ◌ 1 نور گاز 2 چراغ گازی

**gas lighter** *noun*
چەرخ، چەخماخ، فەندەک ◌ فندک

**gas main** *noun*
شالوولەی گاز، سەرلوولەی گاز، شابۆری گاز ◌ شاه‌لوله‌ی گاز

**gasman** /'gæsmæn/ *noun*
گازخوێنەرەوە، فەرمانبەری کۆنتۆری گاز، بەسەرگازڕاگەیشتوو ◌ مأمور کنترل گاز

**gas mantle** = mantle

**gas mask** /'gæs mɑ:sk/ *noun*
دەمامکی گازی، دەمامکی دژی گازی ژاراوی ◌ ماسک ضد گاز سمی

**gas meter** *noun*
گازژمێر، گازپێو، کۆنتۆری گاز ◌ کنتور گاز

**gasohol** /'gæsəhɒl, US -hɔ:l, -hɑ:l/ *noun*
گازۆهۆل (تێکەڵەیەکی بێنزین لەگەڵ ئەلکۆل کە لەچاو بێنزین هەرزانترە) ◌ گازوهول

**gas oil** *noun*
نەوتی گاز، گازۆل ◌ نفت گاز

**gasolene** /'gæsəli:n/ also gasoline = petrol

**gasometer** /gæ'sɒmɪtə(r), US -'sɑ:m-/ *noun*
گازدان، گازدێن، عەماری گاز ◌ مخزن گاز

**gas oven** *noun*
گازی گۆشتبرژێن ◌ فر

**gasp** /gɑ:sp, US gæsp/ *noun*
نقەنق، نقوهۆڕ، نیخەنیخ، هانکەهانک، هەناسەبڕکێ: *to give a gasp of horror/surprise/relief ◊ His breath came in short -sps* ◌ نفس‌نفس

**gas pedal** *noun*
پایەی گاز، گازپێ، پێدالی گاز ◌ پدال گاز

**gasper** *noun*
(بریتانیا و نافەرمی) جگەرە، سیگار (هەرزان) ◌ سیگارت

**gasping** *noun*
لە تینوویتی تیاچوون، تینووکوشت (gaspingly *adv*: بەنقەنق، بە هەناسەبڕکێوە) ◌ هلاک از تشنگی

**gas plant** *noun*
گیاگاز؟، گیایێکی بۆنخۆش لە تیرەی پێنچن rue، بە گوڵی سپی و گەڵای بۆنخۆشەوە [*Dictamnus albus*] ◌ نوعی گیاه

**gas ring** *noun*
گازرینگ، سەرگر(ە) ◌ شعله‌پخش‌کن

**gas station** *noun*
وێستگەی بێنزین، پۆمپی بێنزین ◌ پمپ بنزین

**gas stove** *noun*
گاز ◌ اجاق گاز

**gassy** /'gæsi/ *adjective* (gassier, gassiest)
1 گازاوی، پڕگاز، گازدار، گازئاسا: *UK lagers are criticized for being weak and gassy* 2 زۆربلە، چەقەسرۆ، چەنەهەراش 3 (قسە) هیچ، قۆڕ، پڕوپووچ 4 بەلافوگاف، فیشاڵچی، فشەکەر، خۆهەڵکێش ◌ 1 گازدار، گازمانند 2 وراج 3 بی‌معنی 4 لاف‌زن

**gas tap** *noun*
شیرەی گاز ◌ شیر گاز

**gas-tight** /'gæs taɪt/ *adjective*
گازبڕ، گازبەند ◌ مانع برون‌رفت گاز

**Gastarbeiter** /'gast‚ɑ:bʌɪtə, German 'gast‚arbaɪtɐ/ *noun*
کرێکاری میوان (کەسێ کە بە شێوەی کاتی

مۆڵەت وەردەگرێ تا لە وڵاتێ تر کار بکا) ۞ کارگر مهمان

**Gasthaus** /ˈgasthaʊs/ *noun, pl.* Gasthäuser /-ˌhɔɪzə/
میوانخانە (لە وڵاتانی ئەڵمانیزماندا؛ بنەڕەت: لە ئەڵمانییەوە) ۞ مهمان سرا

**Gasthof** /ˈgasthɒf, German ˈgasthoːf/ *noun, pl.* Gasthöfe or Gasthofs /-ˌhɔːfə, German -ˌhːfə/
هوتێل، میوانخانەی گەورە (لە وڵاتانی ئەڵمانیزمان) ۞ هوتل

**gas-tight** *adjective*
گازبەند، نایەڵێ گاز بدا یان لێی دەرچێ ۞ مانع خروج گاز

**gastr(i)(o)-** *prefix*
پێشگر: گەدە، مێعدە، سک، گەدەیی و...، مێعدەیی و...: (بنەڕەت: لە *gastro-enteritis* یۆنانی *gastēr, gastr-* "stomach") ۞ پیشوند: معده، شکم، معدوی و...

**gastralagia** /gæˈstrældʒɪə/ *noun*
گەدەکزێ، گەدێشە، ژانەگەدە، دڵەکزێ، مێعدەکزێ ۞ معدەدرد

**gastrectomy** /gæˈstrɛktəmi/ *noun, pl.* gastrectomies
گەدەدەرکێشان، گەدەبڕی، مێعدەبڕی ۞ معدەبرداری

**gastri-** = gastr-

**gastric** /ˈgæstrɪk/ *adjective*
گەدەیی، مێعدەیی، سەربە گەدە، پێوەندی بە مێعدەوە هەیە ۞ معدی، وابستە بە معده

**gastric flu** *noun*
بەتای مێعدە یان گەدە: جۆرێ ناسازی یان نارەحەتی کورتماوەی مێعدە کە هۆیەکەی نەزانراوە ۞ آنفلوآنزای معده

**gastric gland** *noun*
لوو یان رژێنەی گەدە(یی): چەندین رژێنە لە دیوارەکانی گەدە یان سک کە ئاوگی گەهرده دەردەدەن ۞ غدەی گاستریک

**gastric juice** *noun*
ئاوگی گەدە، گەداوگ، ئاوگی مێعدە ۞ عصیر معده

**gastric ulcer** *noun*
برینی گەدە یان مێعدە، مێعدەرێژە ۞ زخم معده

**gastrin** *noun*
(زیندەکیمیا) گەدین، گاسترین: هۆرمۆنێ کە هانی دەردانی ئاوگی مێعدە دەدا و لە وەڵام یان کاردانەوەی بوونی خۆراک لە لایەن دیوارەی گەدەوە دەرژێتە نێو رەوتی خوێنەوە ۞ گاسترین

**gastritis** /gæˈstraɪtɪs/ *noun*
ئاوسانی گەدە یان مێعدە، گەدەسوێ، گەدەسووتانەوە ۞ ورم معده

**gastro-** /ˈgastrəʊ/ (also gastr- before a vowel = gastr-

**gastrocnemius** /ˌgastrə(ʊ)ˈkniːmɪəs/ *noun,* also gastrocnemius muscle, *pl.* gastrocnemii /-mɪʌɪ/
گەورەترین ماسوولکەی نەرمەی پووز کە چۆک و پێ دەنووشتێنێتەوە (gastrocnemial, gastrocnemian *adj*) ۞ گاستروکنیمی

**gastroduodenal** *adjective*
گەدە(یی)ـدوانزەگرێیی، مێعدە(یی)ـدوانزەگرێیی: سەربە یان گەدە و دوانزەگرێ یان ئەوان دەگرێتەوە ۞ گاسترودیودنال

**gastro-enteritis** /ˌgæstrəʊ ˌentəˈraɪtɪs, US ˌgæstroʊ/ *noun*
سووتانەوە یان ئاوسانی گەدە (مێعدە) و ریخۆڵە، سکسووتانەوە (gastro-enteric *adj*: سکسووتانەوەیی) ۞ ورم معده و روده

**gastroesophageal** *adjective*
گەدە(یی)ـسوورێنچکی، مێعدە(یی)ـسوورێنچکی ۞ گاسترواِیسوفاگوس

**gastroesophageal reflux** *noun*
گەڕانەوەی گەدە(یی)ـسوورێنچکی، کشانەوەی مێعدە(یی)ـسوورێنچکی: گەڕانەوەی شتی نێو گەدە بۆ سوورێنچک ۞ پسروی گاسترواِیسوفاگوس

**gastroenteroligy** /ˌgastrəʊɛntəˈrɒlədʒɪ/ *noun*
گەردەریخۆڵەناسی: لێکۆڵینەوەی پێکهاتە، کارکرد(ن) و نەخۆشییەکانی ئەندامە هەرسییەکان (digestive organs -gastroenterologist ،roenteroligic(al) *adj n*) ۞ مبحث بیماریهای معده و روده

**gastro-hepatic** *adjective*
گەدە(یی)ـجگەری، مێعدە(یی)ـجگەری ۞ معدی ـ کبدی

**gastrointestinal** /ˌgæstrəʊɪnˈtestɪnl, ˌgæstrəʊɪnteˈstaɪnl, US -roʊ-/
گەدەڕیخۆڵەیی، مێعدەڕیخۆڵەیی، سەربە گەدە و ریخۆڵەکان، هەردووکیان دەگرێتەوە: *gastrointestinal tract* ۞ معده ـ رودەای

**gastrolith** /ˈgæstrəlɪθ/ *noun*
بەردی گەدە یان مێعدە ۞ سنگ معده

**gastrologist** *noun*
خۆراکناس، مرۆی خۆشخۆر، بژاردەخۆر، باشخۆر، خواردە، سەرڕشتەدار لە خواردندا ۞ گاسترونوم، آدم خوش غذا

**gastrology** /gæstˈrɒlədʒɪ/ *noun*
سەرڕشتە لە خواردندا، خۆراکناسی، لێنان و خواردنی خۆراکی باش ۞ گاسترونومی

**gastronome** /ˈgæstrənəʊm/ *noun,* also gastronomist or gastronomer
خۆراکناس، مرۆی خۆشخۆر، بژاردەخۆر،

باش‌خۆر، خوارده ۞ کاسترونوم، آدم خوش‌غذا

**gastronomy** /gæ'strɒnəmi, US -'strɑːn-/ *noun*

هونەر یان زانستی هەڵبژاردن، لێنان و خواردنی خـــۆراکی بـــاش (gastronomic /ˌgæstrə'nɒmɪk, US -'nɑːm-/ or gastronomical *adj*: سەربە هونەر یان زانستی هەڵبژاردن، لێنان و خواردنی خۆراکی باش، خۆش‌خۆری، بژاردەخۆری؛ gastronomically /ˌgæstrə'nɒmkli, US -'nɑːm-/ *adv*: لەباری خۆش‌خۆری‌یەوە) ۞ گاسترونومی

**gastropod** /'gæstrəpɒd, US -pɑːd/ *noun, adjective*

*n* زگپێ، زگپا، سکپێ، سکپا، پێزگ، پازگ، پێ‌بەزگ (هەروەها *adj* gastropodous) سەربە سکپایان ۞ *n* شکم‌پا *adj* وابسته به شکم‌پایان

**Gastropoda** /ˌgæstrə'pəʊdə, US gæs'trɒpədə/ *noun, pl.*

(گیانەوەرناسی) زگپێیان، پازگان، زگپایان، پێ‌بەزگان: پۆلێکی بەربڵاوی لەش‌نەرمەکان کە snail، slug و whelk ـەکان دەگرێتەوە ۞ شکم‌پایان

**gastroptosis** *noun*

گەدە(دا)کەوتن، خزینی مێعدە یان گەدە ۞ سقوط معده

**gastroscope** /'gæstrəskəʊp/ *noun*

گـــەدەبین، مێعـــدەبـــین (gastroscopic /ˌgæstrə'skɒpɪk/ *adj*؛ gastroscopist ؛ gastroscopy /gæ'strɒskəpi/ *n* ؛ *n*) ۞ معده‌نما

**gastrotomy** *noun, pl.* gastrotomies

گەدەبڕی، مێعدەبڕی (gastrotomic *adj*) ۞ گاستروتومی

**gastrotrich** /'gastrə'trɪkə/ *noun*

(گیانەوەرناسی) زگ‌موو(یی) ۞ گاستروتریک

**Gastrotricha** /ˌgastrə'trʌɪkə/ *noun, pl.*

(گیانەوەرناسی) زگموویان: لقێکی چکۆلە لە گیانەوەرە کرم‌ئاسا ئاوی‌یە وردەکان کە کۆمەڵە مژۆڵ cilia یا سمێڵێ دەگرن، دەوروبەری 200 جۆرن و نزیک بە 100 جۆرێکی لە ئەوروپای نـــاوەنـــدی‌دا دەژیـــن (gastrotrich /'gastrə'trɪkə/ *n*: زگ‌موو(یی)؛ بنەڕەت: لە لاتینی نوێ‌وە، لە یۆنانی‌یەوە *gastr-* *gastēr* "stomach" + *thrix* *trikh-* "hair") ۞ گاستروتریکا

**gastrovascular** *adjective*

بۆ هەردوو باری هەرس digestion و سووڕانی خوێن circulation کار دەکا، وەک بۆشایی‌یێ (وەک هێندێ میکرۆب) ۞ گاسترووا‌سکیولار

**gastrula** /'gastrʊlə/ *noun, pl.* gastrulae /-liː/

(ئاولەمەناسی) زگچە، زگۆلە، سکۆلە: ئاولەمەیێ لـــە دوای قۆنـــاخی blastula، کاتـــێ کـــە پێکهاتەیێکی پیاڵەئاسای بۆشە و سێ چین خانەی هەیە (gastrular *adj*: سەربە زگچە، زگۆلەیی، سکۆلـەیـی؛ gastrulation *n*: بوونەزگچە، زگچەیی‌بوون، بوونەزگۆلە، بوونەسکۆلە؛ بنەڕەت: لە لاتینی نوێ‌وە، لە یۆنانی *gastr-* *gastēr* "stomach" + پاشگری چکۆلەنەری *-ula* لاتین) ۞ شکمک

**gas turbine** *noun*

توربینی گازی ۞ توربین گازی

**gasworks** /'gæswɜːks, US -wɜːrks/ *noun, pl.*

گازگـــە، گازگـــا، کارگـــەی گـــاز، کارگـــەی بەرهەم‌هێنانی گاز ۞ کارخانه‌ی گاز

**gat**[1] *noun*

(نافەرمی) دەمانچە، شەشتیر، وەروەر (بنەڕەت: کورتەی Gatling gun) ۞ هفت‌تیر

**gat**[2] = archaic past of get

**gatch** *noun*

گەچ ۞ گچ

**gate**[1] /geɪt/ *noun*

1 دەروازە، درگا(ی گەورە)، دەرکە، درگای حەوشە 2 زوورگە، ڕێگا، ڕێی چوونەژوورەوە 3 (بەندا‌و) زمانە، دەروازە 4 شوێنی هاتنەدەر و چوونەژوورەوە 5 ژمارەی سەیرکەران یان چاولێکەران (وەرزشی ب.ت. تۆپێن) 6 ئەو داهات و بڕەپارەی کە لە فرۆشتنی تیکێتی وەرزشی ب.ت. تۆپێن بەدەس‌هاتووە، فرۆشانە ۞ 1 دروازه، در 2 مدخل 3 دریچه 4 محل ورود و خروج 5 تعداد تماشاچیان 6 گیت

**gate**[2] /geɪt/ *noun*

(بریتانیا، لە ناوی شوێن‌دا) شەقام ۞ خیابان

**gâteau** /'gætəʊ, US gæ'toʊ/ *noun, pl.* gateaus or gateaux /-əʊz/

کەیکی جوانی: ۞ *a strawberry gateau* کیک خامه‌ای

**gatecrasher** /'geɪtkræʃə(r)/ *noun*

میوانی بانگێشتن‌نەکراو، مفتەخۆر، سەیرکەری بێ‌بلیت یان بەدزی‌یەوە ۞ مهمان ناخوانده

**gated** /'geɪtɪd/ *adjective*

بەدەروازە، دەروازەدار، درگادار ۞ دارای درواز یا در

**gated community** *noun*

کۆمەڵە خانووبەرەیەکی بە پەرژین یان دیوار دەورگیراو (لەگەڵ زوورگەیێ کە نۆبەداری لێ‌دەکرێ) ۞ گیمید کامیونیتی

**gatefold** *noun*

نەخشەی قەدکراو یان دانووشتاوی نێو کتێب ۞ گیتفولد

**gatehouse** /'geɪthaʊs/ *noun*

دیوی درگاوان، مالی درگاوان یان دالاندار، ژووری دەرکەوان، دالان ۞ اتاق دربان، خانەی سرایدار

**gatekeeper** /ˈgeɪtkiːpə(r)/ *noun*
درگاوان، دالاندار، نۆبەدار، دەرکەوان، قاپیوان ۞ دربان

**gate-leg table** /ˌgeɪtleg ˈteɪbl/ *noun*, also gatelegged table
میزی (دا)نووشتاو یان قەدکراو، میزی کۆوەبوو ۞ میز تاشو

**gate money** *noun*
ئەو داهات و برەپارەی کە لە فرۆشتنی تیکێتی وەرزشی ب.ت. تۆپێن بەدەس‌هاتووە، فرۆشانە: *Today's gate money will be given to charity* ۞ درآمد حاصله از فروش بلیت ورزشی به ویژه فوتبال

**gatepost** /ˈgeɪtpəʊst, US -poʊst/ *noun*
چوارچێوەی دەروازە ۞ چهارچوب دروازه

**gateway** /ˈgeɪtweɪ/ *noun*
1 دەروازە، دەرکە، درگا 2 ریگا، زوورگە، گوزەر، ریرەو 3 کلیل، ریگای گەیشتن بە، مایەی بەدەس‌هێنانی شتێ 4 ریگایێ کە دوو تۆری کامپیوتێر پێکەوە دەبەستێتەوە ۞ 1 دروازه، در 2 مدخل 3 وسیلەی دستیابی 4 مسیری اتصالی دو شبکەی رایانەای به هم‌دیگر

**gather** /ˈgæðə(r)/ *noun*
چین، دەق، لۆچ (gathered *adj*: چین‌چین، لۆچاوی، چین‌دار، دەق‌دار) ۞ چین، پیلی

**gatherer** /ˈgæðərə(r)/ *noun*
کۆکەرەوە، خڕکەرەوە: *prehistoric hunters and -erers* ۞ گردآورنده

**gathering** /ˈgæðərɪŋ/ *noun, adjective*
1 کۆبوونەوە، کۆمبین، جڤین، کۆڕ، خڕبوونەوە: *a gathering ◊ a social/family gathering* 2 (زانیاری) خڕکردنەوە، کۆکردنەوە: *of religious leaders* 3 *methods of information -ing* ۞ 1 روولەپەرە، روولەزۆری، تاوسەندوو اجتماع، جلسه، گردهمایی 2 گردآوری 3 فزاینده

**Gatling gun** *noun*
جۆرێ سەرەتای شەستیر، بە لوولەی هێشوویی سووڕاوەوە (لە ناوی داهێنەری ئەمریکایی‌یەوە Richard J. *Gatling*) ۞ نوعی تفنگ

**gator** /ˈgeɪtə(r)/ = alligator

**GATT** /gæt/ *abbreviation* General Agreement on Tariffs and Trade
گات (ریکەوتن‌نامەی گشتی بارانە (تەعرفە) و کارداری) ۞ گات

**gauche** /gəʊʃ, US goʊʃ/ *adjective*
دەستەوسان، بەیدەس، بێ‌سەروزمان، گێژ، ناپوخت، ناشارەزا، نەفام، بێ‌ئەقل، گەوج، گەلحۆ: *it would be gauche to mention the subject* ۞ (gaucheness *n*؛ gauchely *adv*) دست‌وپا چلفتی، ناشی، کودن، احمق

**gaucherie** /ˈgəʊʃəri, US ˌgoʊʃəˈriː/ *noun*
گێژی، ناپوختی، ناشارەزایی، نەفامی، بێ‌ئەقلی ۞ حماقت، کودنی

**Gaucher's disease** /ˈgəʊʃeɪz, gəʊˈʃeɪz/ *noun*
جۆرێ ناسازی بۆماوەیی دەگمەنی میتابۆلیزمی چەوری، لە ئەنجامی ناتەواوی هەوێنەیێکەوە تووش دەبێ، گەورەبوونەوەی جەرگ و سپل، قرچۆکی ئێسک و زیانی دەماری لە نیشانەکانیەتی (بنەڕەت: لە ناوی پزشکی فەرەنسی Phillippe C. E. *Gaucher* مەرگ 1918) ۞ نوعی بیماری

**gaucho** /ˈgaʊtʃəʊ, US -tʃoʊ/ *noun, pl.* gauchos
کاوبۆ یان گاوانی ئەمریکای باشووری ب.ت. لە رەگەزی سپانیایی یا سوورپێستانی ئەوێنە ۞ گاچو

**gaud** /gɔːd/ *noun*
(کۆن) شتێکی جوانی و بریقەدار، خشڵ، trinket ،ornament ۞ چیز تزئینی، آرایه

**gaudery** *noun, pl.* gauderies
شت‌ومتی هیچەکە یا زیادی ۞ چیزهای بی‌ارزش

**gaudy**[1] /ˈgɔːdi/ *adjective* (gaudier, gaudiest)
بەزریقەوبریقە، ورشن، زەق، بەئالاوواڵا، سەیر، بریقەدار (gaudily /ˈgɔːdɪli/ *adv*: بریقەدارانە، بە ئالاو واڵاوە؛ gaudiness /ˈgɔːdinəs/ *n*: زریقەوبریقە، ئالاوواڵا، ورشانەوە، بریقەداری) ۞ زرق و برق‌دار

**gaudy**[2] /ˈgɔːdi/ *noun, pl.* gaudies
(بریتانیا) میوانی (ساڵانەی کۆلێژ) ۞ مهمانی

**Gaugamela** *noun*, geographical name
گۆگەمێل، گوگامێلا: ئاوایی‌یێکی کۆن لە ئاشوور Assyria، رۆژهەڵاتی نەینەوا Nineveh: شوێنی تێ‌شکانی ئێرانی‌یەکان لە ئەسکەندەری مەزن Alexander the Great لە 331 پێش‌زایین‌دا (هەروەها شەری ئاربێلا Arbela "شوێنی هەولێری ئێستا"، بڕوانە Cunaxa) ۞ گوگمل

**gauge** /geɪdʒ/ *noun*, also gage
1 ئەندازە، نمرە 2 ئەستووراییی، قالندی 3 (چەک) کالیبر 4 میل، پلە 5 دەزگای پێوان یان ئەندازەگرتن، ئەندازە، ئامێری پێوان 6 (لە لێکدانا) سپنو 7 (ریگای ئاسن) مەودای نێوان دوو رەیل، پانایی ریگای ئاسن 8 پێودانگ، پێوانە، پێوەر 9 (دەریاوانی و کۆن) هەڵومەرجی کەشتی باگەڕ سەبارەت بە با (gaugeable /ˈgeɪdʒəbl/ *adj*: لە پێوان‌هاتوو، شیاوی ئەندازگرتن، شایانی هەڵسەنگاندن؛ gauger *n*: هەڵسەنگێنەر، پێوەر، ئەندازەگر، ئایەرە) ۞ 1 اندازه، درجه 2 ضخامت 3 کالیبر 4 عقربه 5 وسیلەی اندازه‌گیری 6 ـ سنج 7 فاصلەی میان ریل‌ها 8

معیار، مقیاس 9 موقعیت کشتی بادبانی نسبت به باد

**gauge theory** *noun*
هەریەک لەو چەند تیۆرییەی فیزیک کە راگوێستنی هێزێکی بنەڕەتی نێوان دوو پارچۆلکەی کارلێککردوو بەهۆی ئاڵوگۆڕی پارچۆلکەیێکی بنچینەیی (سەرەتایی)یەوە روون دەکەنەوە ◯ نظریەی گیج

**Gaul** /gɔːl/ *noun*
دانیشتووی رەسەنی ناوچەی ئەورووپایی کۆنی گۆل، فەرەنسی ◯ اهل کشور گل، فرانسوی

**Gauleiter** /ˈgaʊlʌɪtə, German ˈgaʊlaɪtɐ/ *noun*
1 (مێژوویی) کاربەدەستێکی سیاسی کە بەسەر ناوچەیێ لەژێر دەسەڵاتی نازیدا حکومەت دەکا 2 کاربەدەستێکی زۆردار (بنەڕەت: ئەڵمانی، لە *Gau* "ناوچەی بەڕێوەبەرایەتی" + *Leiter* "ڕێبەر") ◯ گولیتر

**Gaulish** /ˈgɔːlɪʃ/ *adjective, noun*
*adj* سەربە گۆل یان زمانی گۆلی *n* زمانی (سێلتیکی) گۆلی ◯ *adj* گالی *n* زبان گالی

**Gaullism** /ˈgəʊlɪz(ə)m/ *noun*
گۆلیزم (بنچینە و سیاسەتەکانی سیاسەتوانی فەرەنسی چارلز دۆ گۆل Charles de Gaulle (1890-1970): Gaullist /ˈgəʊlɪst/ *n, adj*: *n* گۆلیست *adj* گۆلیستی) ◯ گالیسم

**Gault clay** /gɔːlt/ *noun*
(زەویناسی) گڵی سەردەمی کریتاسە Cretaceous کە چینی باشووری ئینگلتەرەی پێکهێناوە ◯ خاک گولت

**gaunt** /gɔːnt/ *adjective*
1 پێچوو، رەقەڵ، مردەڵە، کزەڵۆک، بنیس، لاواز 2 وشکوبرنگ، بێناو، قاقر، رووت، چۆڵگە، کەلاوە (gauntly /ˈgɔːntli/ *adv*: کزەڵۆکانە، کزانە؛ gauntness /ˈgɔːntnəs/ *n*) ◯ 1 لاغر، تکیدە 2 برهوت، مخروبە

**gauntlet**[1] /ˈgɔːntlət/ *noun*
دەسەوانە، دەسکێش (لە زری یان کانزا)، دەسکێشی قۆڵچاخی، دەسەوانەی ئاسنین ◯ دستکش

**gauntlet**[2] /ˈgɔːntlət/ *noun*
1 هەڵاتن بە نێو دوو ریز سەربازی داربەدەست وەکوو سزا یان تەمێ‌یێ 2 بەرەنگاربوونەوە، رووبەڕوو وەستان ◯ 1 گونتلت 2 مبارزەطلبی

**gauntry** or gauntree = gantry

**gaur** /ˈgaʊə/ *noun*
گاکێوی هیندی یان مالیزی [*Bos gaurus*] ◯ گاور

**gauss** /gaʊs/ *noun, pl.* same or gausses
(فیزیک) گاوس (= یەکەی هاندانی مەگناتیسی، بەرامبەر بە دەهەزاریەکی tesla؛ بنەڕەت: لە ناوی ریازیزانی ئەڵمانی Karl F. *Gauss*) ◯ گاوس

**Gaussian** *adjective*
گاوسیایی، گاوسی، گاوسیەن: خاوەنی شێوە یان شکڵی normal curve یان Gaussian distribution ◯ گوسین

**Gaussian curve** = normal curve

**Gaussian distribution** /ˈgaʊsɪən/ = normal distribution

**gauze** /gɔːz/ *noun, adjective*
*n* 1 برینپێچ، برنجۆک، برینجۆک 2 تۆڕ، پارچەی تۆڕی، تۆڕی لە وایەر یا تێل *adj* تۆڕی، ناسک، تەنک، شاش (gauzily *adv*: gauziness *n*: تۆڕێتی، تۆڕناسابوون، ناسکی، تەنکی؛ gauzy /ˈgɔːzi/ *adj*: تۆڕی، ناسک، تەنک، شاش، دیار: (*a gauzy material*) ◯ *n* 1 تنزیب 2 توری، پارچەی توری، تور سیم *adj* توری

**gavage** /gaˈvɑːʒ/ *noun*
(بە زۆر) دەرخواردان (دەوا و دەرمان (ب.ت. بە ئاژەڵ) ◯ گاواج

**gave** /geɪv/ = past of give

**gavel** /ˈgævl/ *noun*
1 (دادگا، دانیشتن و هتد) چەکوش 2 داری هەراج یان حەراج auction ◯ 1 چکش 2 چوب حراج

**gavelkind** /ˈgav(ə)lkʌɪnd/ *noun*
(مێژوویی) دابەشکردنی زەویوزاری کەسێکی مردوو بە بێ‌وەسیەت بە قەد یەک لە نێوان کورەکانیدا ◯ گاولکیند

**gavial** /ˈgeɪvɪəl/ = gharial

**gavotte** /gəˈvɒt, US gəˈvɑːt/ *noun*
گەڤات، گاڤۆت: 1 سەما یان هەڵپەرکێی کۆنی فەرەنسی 2 پارچە موسیقایێ بۆ ئەو هەڵپەرکێیە ◯ گاووت

**Gawain** *noun*
گاواین: یەکێ لە سوارچاکانی Round Table ◯ گاواین

**Gawd** /gɔːd/ *interjection*
ئەی خودا، ئەیخوا، خودایە: *For Gawd's sake hurry up!* ◯ خدایا

**gawk** /gɔːk/ *noun*
1 مرۆی دەسەوسان یان بەیدەس، awkward 2 مرۆی شەرمێون، کەسێکی شەرمن ◯ 1 آدم دستوپاچلفتی 2 آدم خجالتی

**gawky** /ˈgɔːki/ *adjective* (gawkier, gawkiest)
دەسەوسان، بێ‌دەس‌وپێ، بەیدەس، زلحۆرت، ستەبەڵە، دەس‌خاو، لەقلۆقی (gawkily /ˈgɔːkɪli/ *adv*: بە شێوەیەکی دەسەوسان؛ gawkiness /ˈgɔːkinəs/ *n*: 1 بێ‌دەس‌وپێیی، دەسەوسانی، زلحۆرت، بەیدەسی، دەس‌خاوی، ستەبەڵەیی، هیچ‌لەدەس‌نەهاتوویی 2

شـەرمێونی، کەمـرووی، لەرووهەڵـنەهاتوویی، شەرمنی) ◌ دستوپاچلفتی، لۆلقو

**gay**[1] /geɪ/ *adjective* (gayer, gayest)

1 هاورەگـەزباز، لووسـکە، هاورەگـەزخواز، *the* ◊ *a gay club/bar* :homosexual ◊ *gay men* ◊ *lesbian and gay community* 2 شـاد، *I didn't know he was gay* سـەرخۆش، خۆشـحاڵ، بـەگوڕ، بەکـەیف، روو بەپێکەنین، بەدەماخ: *She felt lighthearted* 3 بێ‌فکر، بێ‌خەیاڵ، *gay laughter* ◊ *and gay* بێ‌خەم، بەفشەگرتوو 4 زریقەوبریقە، بەئاڵاواڵا، زەرقی: *The garden was gay with red geraniums* ◌ 1 همجنس‌باز 2 شادمان، بانشاط 3 بی‌فکر، بی‌خیال 4 اجق و وجق

**gay**[2] /geɪ/ *noun*

کەسێکی هاورەگەزخواز (ب.ت. پیاو) ◌ آدم همجنس‌باز

**gayal** /gʌɪ'jɑ:l, US -'jal/ *noun*

گای ماڵی (لە نیمچەوشکاری هیندوستان) ◌ گاو اهلی

**gay liberation** *noun*, also gay lib

بزووتنەوەی ئازادی هاورەگەزخوازان ◌ جنبش آزادی همجنس‌بازان

**gayness** /'geɪnəs/ *noun*

هاورەگەزبازی، هاورەگەزخوازی، هاوبازی ◌ همجنس‌بازی

**gay pride** *noun*

شـانازی هاورەگـەزخوازی (بزووتنەوەیـەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی): *a gay pride parade* ◊ *a song inspired by a mixture of gay pride and personal anguish* ◌ افتخـار همجنس‌بازی

**gayety** etc = US variant spelling of gaiety etc

**gazania** /gə'zeɪnɪə/ *noun*

گازانیـا: ڕووەکێکـی گیائاسـای گـەرمێنان tropical لـە تـیرەی daisy بـە گوڵـی زەرد و پرتەقاڵییەوە [توخم *Gazania*] ◌ گازانیا

**gaze** /geɪz/ *noun*

چاوتێبڕین، چاوزەق‌کردنەوە، چاوئەبلەق‌بوون، چاوداپچڕین، چاودەربەڕین، واقمان: *He met her gaze* (= looked at her while she looked at him) ◌ نگاه خیره

**gazebo** /gə'zi:bəʊ, US -boʊ/ *noun, pl.* gazebos or gazeboes

(خـانوو ب.ت. قوختـە) دیارگـە، کلاوفـەرەنگی ◌ کلاەفرنگی

**gazelle** /gə'zel/ *noun*

(گیانەوەرناسـی) ئاسـک، کـەژاڵ، مـامز، خـەزاڵ [*Gazella* و توخمەکانی تر، چەندین جۆرن] (بنەڕەت: لە *ghazāl* عەرەبییەوە) ◌ آهو

**gazer** *noun*

چاوتێبـڕ، چاوزەقـەوەکردوو، چاوئەبـڵەق، چاوداپچڕیو ◌ خیره‌نگر

**gazette** /gə'zet/ *noun*

1 ڕۆژنامەی فەرمی، ڕۆژنامە 2 newssheet ◌ روزنامەی رسمی، روزنامه

**gazetteer** /ˌgæzə'tɪə(r), US -'tɪr/ *noun*

1 فەرهـەنگی نـاوە جـوگرافییـەکان، ئیندێکـسی نـاوە جـوگرافییـەکان 2 (کـۆن) journalist, publicist ◌ فهرست اسامی جغرافیایی

**gazillion** /gə'zɪljən/ *noun*, also kazillion

گـازیلیون (ژمارەیـەکی یـەکجار زۆر): *gazillions of* ◊ *gazillion-dollar houses* (gazillionth *adj*) *copies* ◌ گازیلیون

**gazillionaire** = zillionaire

**gazpacho** /gəs'pɑtʃəʊ/ *noun, pl.* gazpachos

جۆرێ سوپی سـاردی سپانیایی کە بە باینجان، بیبار و سەوزەی تری سـالاد لێدەنرێ (بنەڕەت: لە سپانیاییەوە) ◌ گازپاچو

**gazumper** *noun*

گەڕپێکـەر، دەبەپێکـەر، تەشقەڵـەباز، تەشقەڵەپێکەر ◌ دبەدرآور

**gazumpimg** /gə'zʌmpɪŋ/ *noun*

گـەڕپێکردن، گـەڕتێئاڵانـدن، تەشقەڵـەبازی ◌ دبەدراوری

**GB** /ˌdʒi: 'bi:/ *abbreviation* Great Britain

**GBH** /ˌdʒi: bi: 'eɪtʃ/ *abbreviation* grievous bodily harm

**Gbyte** *abbreviation* gigabyte(s)

**GCE** /ˌdʒi: si: 'i:/ *abbreviation* General Certificate of Education

1 (لـە بریتانیـا) تـاقیکـاری کۆتـایی سـێکلی یەکەمی ناوەندی 2 بڕوانامەی کۆتایی سێکلی یەکەمی ناوەندی (جی‌سی‌ئی لە 1988دا جێی خۆی دا بە جی‌سی‌ئێس‌ئی) ◌ جی‌سی‌ای

**GCSE** /ˌdʒi: si: es 'i:/ *abbreviation* General Certificate of Secondary Education

1 تـاقیکـاری کۆتـایی قۆنـاخی ناوەنـدی 2 بڕوانامەی کۆتایی قۆناخی ناوەندی (لە بریتانیا، وێلز و ئیرلەندی باکووری) ◌ جی‌سی‌اس‌ای

**Gd** *abbreviation* gadolinium

**gdn** = garden

**Gdns** = Gardens

**GDP** /ˌdʒi: di: 'pi:/ *abbreviation* gross domestic product

**GDR** /ˌdʒi: di: 'ɑ:(r)/ *abbreviation* German Democratic Republic

**Ge** *abbreviation* germanium

**gean** /gi:n/ *noun*, also wild cherry

گێلاسی شیرین یا کێوی [*Prunus avium*] ◌ گیلاس شیرین یا وحشی

**geanticlinal** *adjective*
سەربە پشتەزەوی، سەربە تاقی زەوی یان عەرز ۞ وابسته به تاقزمین

**geanticline** *noun*
(زەویناسی) ژیەنتیکلین، پشتەزەوی، تاق یا قوقزی زەوی ۞ تاقزمین

**gear** /gɪə(r), US gɪr/ *noun*
1 گێر، گیر، چەرخ یان پێچکەی ددانەدار 2 دەزگا، ئامێر، ئامراز، هەجەت 3 بەرگ، شمەک 4 میزانکردنی میکانیزمی گێر 5 (خوازە) لێوەشاوەیی، لێهاتوویی 6 چالاکی، خێرایی، جموجۆل 7 (نافەرمی) دەرمانی ناقانوونی 8 پێداویستی یان کەلوپەلی بەستنی بادەوەی کەشتی ۞ 1 دنده، چرخدنده 2 دستگاه، لوازم 3 لباس 4 تنظیم سازوکار دنده 5 (مجازی) کفایت 6 فعالیت، سرعت 7 (عامیانه) مواد غیرقانونی 8 گیر

**gearbox** /ˈgɪəbɒks, US ˈgɪrbɑːks/ *noun*, also gearcase
گیربۆکس، گێرخانە، سنووقی گێر، گێردین ۞ جعبەدنده

**gear-change** *noun*
گۆڕینی گێر، گێرگۆڕی ۞ تعویض دنده

**geared** /gɪəd, US gɪrd/ *adjective*
ئامادە، ساز، تەیار، بەدەستەوە، حازر: *The resort is -d towards children* ۞ آماده، حاضر

**geared up** *adjective*
ئامادە، ساز، تەیار، بەدەستەوە، حازر ۞ آماده، حاضر

**gear lever** *noun*
دەسکەگێر، دەسکی گێر، دەندەمیل، میلدەندە، دەسکەدەندە ۞ دستەدنده

**gear shift** = gear lever

**gear stick** = gear lever

**gear train** *noun*
جووڵە لە شەفتێکەوە بۆ یەکێکی تر رادەگوێزێ ۞ گیرترین

**gearwheel** /ˈgɪəwiːl, US ˈgɪrwiːl/ *noun*
ددانەگێر، ددانەبەپێچک، چەرخ یان پێچکەی ددانەدار، (لە دووچەرخەدا) پێچکەی ئاوزەنگی، مووروچەگەورە ۞ چرخدنده، چرخ رکاب

**Geat** *noun*, Old English *Gēat*
گیت: ئەندامی گەلێکی سکاندیناڤی Scandinavian باشووری سوید کە قارەمانی ئەفسانەیی Beowulf سەربەوانە ۞ گیت

**Geatish** *adjective*
گیتی، سەربە یان پێوەندی بە گیتەوە هەیە ۞ وابسته به گیت

**gecko** /ˈgekəʊ, US ˈgekoʊ/ *noun*, *pl.* geckos or geckoes
مارمێلک (مالی، هی ناوچە گەرمەکان، شەوگەڕی مێرووخۆر [Gekkonidae و خێزانە پێوەندیدارەکان، زۆر جۆرن]) ۞ مارمولک

**gee**[1] /dʒiː/ *noun*
تیپ یان پیتی جی G ۞ حرف G

**gee**[2] /dʒiː/ *noun*
هەزاری، هەزار دۆلاری ۞ هزاری

**gee**[3] /dʒiː/ *interjection*
1 وەی، ئاخ، خوایە، ئەح، عەجەب، تیاح، بەح (رەنگە کورتەی Jesus بێ) 2 (gee up، بۆ ئەسپ و هتد) ها، دەی ۞ 1 وای، عجبا 2 هی

**geebung** /ˈdʒiːbʌŋ/ *noun*
جۆری دەوەن یان دارێکی چکۆلەی ئەوستڕالیایی، بەرێکی سەوزی وردی هەیە [توخم *Persoonia*] ۞ جیبانگ

**Geechee** /ˈgiːtʃiː/ *noun*
1 زمانێکی کریۆلی ئینگلیسی، لە لایەن رەشەکانی چەندین بەشی کارۆلینای باشووری و جۆرجیا قسەی پێدەکرێ 2 ئاخێوەر یان قسەپێکەری ئەم زمانە ۞ گیچی

**gee-up** *interjection*
ها، دەی ۞ هی

**geese** /giːs/ = plural form of goose

**geest** *noun*
ماک و مەتریاڵی نیشتووی ناستی زەوی ۞ جیست

**gee-string** = G-string

**gee whiz** /ˌdʒiː ˈwɪz/ = gee 1

**Ge'ez** /ˈgiːɛz/ *noun*
زمانێکی کۆنی سامی Semitic ئەتیۆپیایی، کە زمانی ئەریت و سروت و دینی کلیسەی ئۆرتۆدۆکسی ئەتیۆپییە ۞ جیز

**geezer** /ˈgiːzə(r)/ *noun*
1 پیاو ب.ت. پیری 2 سەیر ۞ 1 یارو 2 عجیب و غریب

**Gehenna** /gəˈhɛnə/ *noun*
دۆژە، جەهەنم، دۆزەخ (بنەرەت: عیبری *gē' hinnōm*) ۞ جهنم

**Geiger counter** /ˈgaɪgə kaʊntə(r), US ˈgaɪgər/ *noun*
ژمێرەری گایگێر (= دەزگایێ بۆ پێوانی رادیۆئەکتیڤیتی؛ بنەرەت: لە ناوی فیزیکزانی ئەڵمانی Hans Geiger، مەرگ 1945) ۞ شمارگر گایگر

**geisha** /ˈgeɪʃə/ *noun*, also geisha girl
گەیشا (کچە گۆرانیبێژ و سەماکاری ژاپۆنی) ۞ گیشا

**Geist** /gʌɪst/ *noun*
(ئەڵمانی) گیان، رۆح (هی کەسێ یان دەستەیێ) ۞ روح

**geitonogamy** /ˌgʌɪtəˈnɒgəmi/ *noun*
چاککردنی گیایێ بە هەلالەی گیایێکی تر هەر لەسەر ئەو گوڵە (بڕوانە xenogamy. لە یۆنانی *geitōn*, "neighbour" + *geitono-*

("marriage" *gamos* ۞ گایتونوگامی

**gel** /dʒel/ *noun*
ولولـە، دەلـەمە(ک)، ژێـل (بنـەڕەت: کورتـەی gelatin) ۞ ژل

**gelable** *adjective*
لەولولەهاتوو، دەلەمێنریَ ۞ ژلابل

**gelada** /dʒə'lɑːdə/ *noun, pl.* same or geladas, also gelada baboon
(گیانـەوەرناسـی) baboon یەکی مەیلـەوقاوەیی یاڵدرێژ، ڕەسـەنی ئەتیۆپیا [ *Theropithecus gelada* (لە *č'ällada* ی Amharic ۞ جلادا

**gelati** = plural form of jelato

**gelatination** /'dʒelætəneɪʃn/ *noun*
ولولاندن، بەولولەکردن، رینگاندن، دەلـەماندن، کردنەدەلـەمە، ژێلاندن ۞ تبدیل به ژلاتین

**gelatine** /'dʒelətɪn/ *noun,* also gelatin /'dʒelətiːn/
1 ولولـــە، رینـــگ، رینگـــاو، ژێلاتـــین 2 تەقەمەنی‌یێکی بەهێز ۞ ژلاتین

**gelatiniform** *adjective*
ولولەئاسـا، رینگانـە، ولولـەیی، شێوەولولـە، لەژێلاتین‌چوو ۞ ژلاتین‌مانند

**gelatinoid** *adjective*
ولولەیی، ولولەئاسا، شێوەولولە، لەژێلاتین‌چوو ۞ ژلاتین‌مانند

**gelatinous** /dʒə'lætɪnəs/ *adjective*
1 ولولـەیی، ژێلـەیـی، ولولەئاسـا، رینگـی، رینـگ‌ئاسـا، شێوەولولـە، لـەژێلاتین‌چـوو: *a gelatinous precipitate* 2 لیچـق، لیـنج (gelatinously *adv*) ۞ 1 ژلەمانند، ژلاتینی 2 لزج

**gelatin paper** *noun*
کـاغزی ولولـەیی (بۆ کاروبـاری وێنـەگری) ۞ کاغز ژلاتینی

**gelation** /dʒe'leɪʃn/ *noun*
1 ولولان، بوونەولولە، بوونەرینگ، دەلـەمەبوون 2 بەسـتن، ڕەقبـوون، تونـدبوون، گیرسـان ۞ 1 ژله شدن 2 انجماد

**gelato** /dʒə'lɑːtəʊ/ *noun, pl.* gelati /dʒə'lɑːti/ or gelatos
بەستەنی ئیتالیایی (لە ئیتالیایی‌یەوە) ۞ ژلاتو

**gelded** *adjective*
یەختەکراو، خەساو، گوندەرهاتگ ۞ اختەشده

**gelding** /'geldɪŋ/ *noun*
1 گیانەوەری خەساو یان یەختـە(کراو) ب.ت. ئەسپ 2 (کۆن) = eunuch ۞ حیوان اختـە بـه ویژه اسب

**gelid** /'dʒelɪd/ *adjective*
1 زۆر سارد، تەشلەخە، شکست‌وبەند، تۆف‌وبەند، جەبەرە: *a gelid pond* ◊ *gelid water* 2 زۆر نادۆستانە: *a gelid reply* ۞ بسیار سرد

**gelidity** /dʒe'lɪdɪtɪ/ *noun*
ساردی، بەستوویی، شکست‌وبەندی، تۆف‌وبەندی ۞ سردی

**gelignite** /'dʒelɪgnaɪt/ *noun*
ژێلینیـت (تەقەمـەنی‌یـەکی بـەهێزە کـە لـە ترشەلـۆکی نیتریـک و گلیسـیرین چـێ‌دەبـێ؛ بنـەڕەت: ڕەنگـە لـە *(l)ignis* + gelatin لاتـین "دار" + ite¹-) ۞ ژلینیت

**gelsemium** /dʒel'siːmɪəm/ *noun*
ئامـادەکردنی وردەڕەگـی یاسـەمەنی زەرد، لـە homeopathy بۆ چارەکردنی نەخۆشی پەتاناسا (بنـەڕەت: لـە *gelsomino* ئیتالیـایی "jasmine") ۞ جلـسیموم

**gelt** /gelt/ *noun*
(ئافـەرمی) پـارە، پـوول (بنـەڕەت: لـە *Geld* ئەلمانی "پارە") ۞ (عامیانه) پول

**gem** /dʒem/ *noun*
1 گەوهـەر، جـەواهێر 2 (خـوازە) شـتی یـەکجار بەنرخ، گەوهـەر (gem-like *adj*) ۞ 1 جـواهر، گوهر 2 چیز بسیار باارزش

**Gemara** *noun*
گیمارا، گیمۆرا: لێکدانـەوە یـان شرۆڤـە لەسـەر Mishnah کـە بـەشـێ دووهـەمـی Talmud پێکدێنێ (بنەڕەت: لە *gĕmārā* ئارامی) ۞ گمارا

**Gemaraic** *adjective*
سـەربە یان پێوەندی بە Gemara وە هەیە ۞ وابسته به گمارا

**Gemeinschaft** /gə'mʌɪnʃaft/ *noun*
(ئەلـمانی) پێوەنـدی کۆمەلایـەتی چـڕ و نزیـک (وەکوو پێوەندی خێزانی، بڕوانە Gesellschaft) ۞ گمین‌شافت، گماینشافت

**gemel** /dʒeməl/ *adjective*
1 دوو ئەونـــدە، دووچەنـــدان، دوو بەرامبـــەر 2 هاوزا، دوانە، جـووتی، دوانـەیی ۞ 1 مـضاعف، توأم 2 دوتایی

**geminate** /'dʒemɪneɪt, US -nət/ *adjective*
هاوزا، دوانە، جووت ۞ توأم، دوتایی

**gemination** /ˌdʒemə'neɪʃn/ *noun*
(بە)جووت‌بوون ۞ جفت‌شدگی

**Gemini** /'dʒemɪnaɪ, US -ni/ *noun*
1 (ئەستێرەوانی) جووتەوانە، جمکان (Castor و Pollux): کۆئەستێرەی باکووری (the Twins) کە دەلـێن دووانەی کاسـتۆر و پۆلۆکس پیشان دەدا 2 سێیەمین کەلوو لە زۆدیاک (لاتین، کۆی *geminus* "دووانە twin") ۞ جوزا، دوپیکر

**Geminian** /dʒemɪ'niːən/ *adjective*
جووتەوانەیی، سەربە جمکان ۞ جوزائی

**gemma** /'dʒemə/ *noun, pl.* gemmae /-miː/
1 چەقـەرە، چەکـەرە، کـورس، خونچـە، چـرۆ، پـــۆخ، گۆپکـــە 2 وشـــەیێکـــی تـــر بـــۆ chlamydospore (بنەڕەت: لە لاتینەوە "bud, jewel") ۞ جوانه، غنچه

**gemmate** /ˈdʒɛmeɪt/ *adjective*
بەچـــرۆ، پۆخـــاوی، خونچـــەدەرکردوو، گۆپکەکردوو ◌ دارای جوانه

**gemmation** /dʒɛˈmeɪʃ(ə)n/ *noun*
چرۆدەکـردن، خونچـەدەکردن، گۆپکـەکردن، هاتنەبەر بەهۆی چەکەرەوە ◌ جوانەزنی

**gemmed** *adjective*
گەوهەرنیشان، جەواهیرنیشان ◌ مرصع

**gemmiferous** /dʒɛˈmɪfərəs/ *adjective*
خونچەدەرکەر، چرۆدەرکەر ◌ جوانەزن

**gemmiparous** /dʒɛˈmɪp(ə)rəs/ *adjective*
چـرۆپێکهێن، خونچەدروسـکەر، چرۆدەرکـەر، خونچەکەر ◌ جوانەزا

**gemmological** *adjective*
سەربە گەوهەرناسی ◌ جواهرشناختی

**gemmologist** *noun*, also gemologist
گەوهەرناس ◌ جواهرشناس

**gemmology** *noun*, also gemology
گەوهەرناسی ◌ جواهرشناسی

**gemmule** /ˈdʒɛmjuːl/ *noun*
گۆپکیلـە، گۆپکـەی چکۆلـە، چرۆکـە، چـرۆژە (بنـەڕەت: لـە فـەرەنـسـە، لـە *gemmula* لاتـین، چکۆلێنراوی *gemma* "bud") ◌ جوانەی کوچک

**gemmy** /ˈdʒɛmɪ/ *adjective*
گەوهەرناســا، شــێوەگەوهەر، پرشــنگدار ◌ جواهرمانند، درخشان

**gemote** *noun*, also gemot
ژیمـــوت (ئەنجومـــەنی دادپـــەروەری یـــان قـــانووندانـــان لـــە ئینگلتـــەرە پـــێش گـــرتنی نورماندییەکان) ◌ ژیموت

**gemsbok** /ˈxɛmzbɒk, US ˈxɛms-/ *noun*
بزنەکێوی یان ئاسکەکێوییەکی گەورە، ڕەسەنی باشـــووری ڕۆژاوا و ئـــەفریکای ڕۆژهـــەلات [*Oryx gazella*] ◌ نوعی بزکوهی

**gemstone** *noun*
گەوهەر، جەواهیر ◌ جواهر، گوهر

**gemütlich** /ɡəˈmuːtlɪx, German ɡəˈmyːtlɪç/ *adjective*
خۆش، دڵخۆش، خۆشحاڵ، بەکەیف، دڵشاد، ئاسوودە ◌ خوشایند، مسرور، راحت

**gemütlichkeit** /ɡəˈmuːtlɪxkʌɪt, German ɡəˈmyːtlɪçkaɪt/ *noun*
(ئەڵـــمانیایی) ڕووخۆشـــی، دۆســـتایەتی ◌ خوش‌مشربی، رفاقت

**gen** /dʒen/ *noun*
(نافەرمی) زانیاری ◌ اطلاعات

**Gen** = 1 general (military) 2 Genesis (in biblical references)

**gen(o)-** *prefix*
پێشگر: ڕەگەز، توخم، نژاد، جۆر، چەشن، ئاوا، ژین، بۆهێڵ (بنەڕەت: لە *genocide*، *genotype* یونانی "race") ◌ پیـشوند: جـنس، نـژاد، نوع، گونه، ژن

**-gen** *suffix*
پاشـگر: پێکهـێن، سـاز، هەڵـێن، پەیداکـەر، هێن(ەر)، بەرهەمهێنەر: (کیمیا) ئامـاژە بـە ماکێ کە شتێ بەرهەم دێنێ: *allergen*؛ (ڕووەکناسی) ئامـاژە بـە مـاک یـان گیایـێ کـە دێتـەبـەرهـەم: *cultigen* (بنەڕەت: لەسـەر بنچینـەی *gignomai* "لە دایکبوون، بوون") ◌ پسوند: زا، آور، مولـد، تولیدکننده

**Gen AF** *abbreviation* general of the force

**gendarme** /ˈʒɒndɑːm, US ˈʒɑːndɑːrm, French ʒɑ̃daʀm/ *noun*
ئەنـدامی هێـزی پۆلیـسی فەرەنـسی، ژانـدارم (بنـەڕەت: لـە *gens d'armes* فـەرەنـسییەوە بـە واتای "پیاوانی چەکدار") ◌ ژاندارم

**gendarmerie** /ʒɒnˈdɑːməri, French ʒɑ̃daʀm(ə)ʀi/ *noun*, also gendarmery
ژاندارمری، هێزی ژاندارمەکان، بارەگای هێزێکی وا ◌ ژاندارمری

**gender** /ˈdʒendə(r)/ *noun*
(ڕێزمـان) زایەنـد، نێرمـایی، ڕەگـەز (**gendered** *adj*) ◌ جنس، جنسیت

**gene** /dʒiːn/ *noun*
نژادە، بۆهێڵ، ژین: *a dominant/recessive gene* (ئەڵمانی *Gen*)، جین، ژین (بنەڕەت: لە *pan-* یونـانی "all" + *genos* "race, kind, offspring") ◌ ژن

**genealogical** /ˌdʒiːniəˈlɒdʒɪkl, US -ˈlɑːdʒ-/ *adjective*
ڕەچەڵەکناسییانە، سەربە ڕەچەڵەکناسی ◌ تبارشناختی

**genealogically** /ˌdʒiːniəˈlɒdʒɪkli, US -ˈlɑːdʒ-/ *adverb*
لـەباری ڕەچەڵـەکناسـییـەوە ◌ از لحـــاظ تبارشناختی

**genealogical tree** *noun*
ڕەچەڵەکنامە ◌ شجره‌نامه

**genealogist** /ˌdʒiːniˈælədʒɪst/ *noun*
ڕەچەڵەکناس، بنەچەکناس ◌ تبارشناس

**genealogy** /ˌdʒiːniˈælədʒi/ *noun*, *pl.* genealogies
1 ڕەچەڵەکناسی، بنەچەکناسی 2 ڕەگەزنامە، ڕەچەڵەکنامە 3 ڕەچەڵەک، بنەچەک، خێزان ◌ 1 تبارشناسی 2 شجره 3 تبار، نسب

**gene pool** *noun*
نـــژادەدان، بـــۆهێڵدان، ژیـــندان، ژیـــندیـــن، ئەستێرەژین ◌ استخر ژن

**genera** /ˈdʒenərə/ = plural form of genus

**general** /ˈdʒenrəl/ *adjective, noun*

*adj* 1 گشتی، هەمەکی، هەموو، خەڵک، خەڵکی
رەمەکی، جەماوەر، تێکڕا، گشت، گشتگیر،
گشتگرەوە، نابەرتەسک، هەمووگر، سەراپاگیر،
سەرتاسەری، سەرانسەری، هەمەلایەنە،
گشتلایەنە: *The general opinion is that*
*the* ◊ *the conference was a success*
*general belief/consensus* 2 هەمیشەیی 3
ئاسایی، عەدەتی: *This opinion is common*
*among the general population* (=
*ordinary people)* 4 (لە لێکدانا) سەرـ
ـگشتی، سەرۆک، سەرۆکی گشتی، فەرماندەر،
سەرکردە *n* ژێنراڵ: *a four-star general* ◊
*General Tom Parker* ۞ *adj* 1 عمومی،
همگانی، کلی، عامه، عوام‌الناس، جامع، فراگیر 2
دائمی 3 معمولی 4 (در ترکیب) ـکل، رئیس، رئیس
کل، فرمانده *n* تیمسار

**general anaesthesia** *noun*
بێهۆش‌کردنی گشتی، بێهۆشی گشتی (لە بەرامبەر
شوێنێکی تایبەتی‌دا) ۞ هوش‌بری عمومی

**General Assembly** *noun*
ئەنجومەنی گشتی، کۆبوونەوەی گشتی
(نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان و هتد) ۞
مجمع عمومی

**general Certificate of Education** = GCE

**general Certificate of Secondary Education** = GCSE

**general concept** *noun*
چەمکی گشتی ۞ مفهوم کلی

**general counsel** *noun*
سەرپارێزەر، پارێزەری سەرەکی ۞ وکیل اصلی

**General Court** *noun*
دەستەی قانوون‌دانان؛ دەستەی قانوون‌دانانی
هەرێمی یان ئەیالەتی (Massachusetts و
New Hampshire) ۞ هیأت مقننه (ایالتی)

**general dealer** *noun*
کاردار یان فرۆشیاری هەمەبابەت ۞ تاجر یا
فروشندەی عمومی

**general delivery** = poste restante

**general election** *noun*
هەڵبژاردنی گشتی، هەڵبژاردنە گشتی‌یەکان ۞
انتخابات عمومی

**general headquarters** *noun, pl.* also GHQ
بارەگای گشتی ۞ ستاد کل

**generalissimo** /ˌdʒɛn(ə)rəˈlɪsɪməʊ/ *noun*, also generalissimos
فەرمانداری گشتی، سەرفەرماندار ۞ فرماندەی
کل قوا

**generalist** /ˈdʒenrəlɪst/ *noun*
مرۆی ناپسپۆڕ یان هەزارپیشە، هەمەکارە،
فرەشارەزا، فرەزان ۞ آدم غیرمتخصص یا
همه‌فن‌حریف

**generality** /ˌdʒenəˈræləti/ *noun, pl.* generalities
1 گشتی‌بوون، گشتێتی، دەربڕینی بەگشتی،
هەمەلایەنی، گشتلایەنی، زۆرداگرتن: *to*
*speak in broad generalities* ◊ *As usual,*
*he confined his comments to generalities*
2 زۆرینە، بڕانی: *This view is held by the*
*generality of leading scholars* 3 بەشی
سەرەکی ۞ 1 عمومیت، کلیت، شمول 2 اکثریت
3 قسمت عمده

**generalization** /ˌdʒenrəlaɪˈzeɪʃn, US -ləˈz-/ *noun*
گشتاندن، تێکڕایی‌کردن، دەرکردنی بڕیارێکی
گشتی، ئەنجامی گشتی: *a speech full of*
*broad/sweeping generalizations* ◊ *Try to*
*avoid generalization* ۞ تعمیم، نتیجەی کلی

**generalized** /ˈdʒenrəlaɪzd/ *adjective*
1 گشتێنراو، بڕیاری گشتی دەرکراو 2 گشتی،
هەمەکی، ناتایبەتی، ناسنووردار، تەشەنەکردوو،
بڵاوەبوو، هەمەلایەنە، سەراپاگیر، گشتگرەوە،
گشتلایەنە، بەربڵاو، بەرفرەه ۞ 1 تعمیم‌یافته 2
عمومی، کلی، رایج، گسترده

**general knowledge** *noun*
زانیاری گشتی ۞ اطلاعات عمومی

**general linguistics** *noun*
زمانەوانی گشتی ۞ زبان‌شناسی همگانی

**general low** *noun*
زاکوون یان قانوونی گشتی ۞ قانون کلی

**general laws of science** *noun*
زاکوون یان قانوونە گشتی‌یەکانی زانست ۞
قوانین کلی علم

**generally** /ˈdʒenrəli/ *adverb*
بەگشتی، بە تەواوەتی، زۆرتر: *The plan was*
*generally welcomed* ◊ *I generally get up*
*at six* ۞ عموماً، به طور کلی، معمولاً

**general meeting** *noun*
کۆبوونەوەی گشتی ۞ همایش عمومی

**general of the air force** *noun*
ژێنراڵی هێزی ئاسمانی (ئەمریکا) ۞ ژنرال
نیروی هوایی

**general of the army** *noun*
ژێنراڵی ئەرتەش ۞ ژنرال نیروی زمینی

**general phenomenology** *noun*
دیاردەناسی گشتی ۞ پدیدارشناسی عمومی

**General Post Office** *noun*
(لە بریتانیا) بەڕێوەبەرایەتی پۆستی گشتی،
بەڕێوەبەرایەتی سەرەکی پۆستی شار (ئێستا بە
ناوی Post Office) ۞ ادارەی پست عمومی

**general practice** *noun*
نۆژداری یان پزشکێتی گشتی ۞ پزشکی عمومی

**general practitioner** *noun*

نۆژدار یان پزشکی گشتی ۞ پزشک عمومی
**general public** *noun*
گشت خەڵک، خەڵکی ئاسایی، خەڵکی رەمەکی ۞ عامەی مردم
**general-purpose** *adjective*
هەمەکارە، گشت‌مەبەستە، بۆ زۆر مەبەست بەکار دێ: *a general-purpose farm vehicle* ۞ همەمنظورە
**general semantics** *noun*
واتاناسی گشتی ۞ معنی‌شناسی عمومی
**generalship** /'dʒenrəlʃɪp/ *noun*
1 شارەزایی فەرمانداری، لێهاتوویی سەرکردایەتی، ژێنرالیەت، پلەوپایەی ژێنرالی 2 ریبەرایەتی، هەڵسووراندن، بەڕێوەبەرایەتی، سەرکردایەتی (ب.ت. لە شەڕدا)، leadership ۞ 1 مهارت فرماندهی، تیمساری 2 ادارە، مدیریت
**general staff** *noun*
بارەگای سەرکردایەتی، بارەگای فەرمانداری یان فەرماندەری ۞ ستاد فرماندهی
**general store** *noun*
فرۆشگا یان دووکانی گشتی (کە لە زۆر بابەت دەفرۆشی، ب.ت. لە شاریکی چکۆلەدا) ۞ فروشگاه عمومی
**general strike** *noun*
مان(گرتن)ی گشتی ۞ اعتصاب عمومی
**general welfare** *noun*
ئاسوودەیی گشتی، ژین‌فرەهی گشتی ۞ رفاه عمومی
**generating** *adjective*
بەرهەم‌هێنەر، پێکهێن(ەر) ۞ مولد
**generating function** *noun*
فانکشنی پێکهێنەر، فانکشنی بەرهەم‌هێنەر (بیرکاری) ۞ تابع مولد
**generating station** *noun*
وێستگەی بەرهەم‌هێنان (کارەبا) ۞ نیروگاه
**generation** /ˌdʒenə'reɪʃn/ *noun*
1 بەرهەم‌هێنان، پێکهێنان، پەیداکردن، دروستکردن: *the generation of electricity* 2 زاوزێ، پەیداکردن، وەچەخستنەوە 3 وەچە، بەرە، پشت، نفش، نەوە، دەقڵ: *the fifth-generation* ◊ *younger/older -eration* *a new generation of vehicle* ◊ *computing* ۞ 1 تولید 2 توالد 3 نسل
**generational** /ˌdʒenə'reɪʃənl/ *adjective*
سەربە بەرە یان نەوە، نفشی، وەچەیی ۞ وابستە بە نسل
**generation conflict** *noun*
ململانێی نێوان دوو بەرە ۞ نزاع میان دو نسل
**generation gap** *noun*
جیاوازی یان کەلێنی نێوان دوو بەرە ۞ شکاف میان دو نسل

**Generation X** *noun*
نەوە یان وەچەی X (ئەو خەڵکەی کەوا لە نێوان شەست و حەفتاکاندا لە ئەمریکا لە دایک بوون) ۞ نسل X
**generative** /'dʒenərətɪv/ *adjective*
1 بەرهەم‌هێنەر، دروسکەر، داهێنەر: *-nerative processes* 2 (زمانەوانی) زایا، بەرهەم‌هێنەرانە 3 زاوزێیی ۞ 1 مولد 2 زایشی 3 تناسلی
**generative cell** = gamete
**generative grammar** *noun*
(زمانەوانی) 1 ڕێزمانی زایا یان بەرهەم‌هێنەرانە 2 - transformational grammar ۞ دستور زبان زایشی
**generative linguistics** *noun*
زمانەوانی زایا یان بەرهەم‌هێنەرانە ۞ زبان‌شناسی زایشی
**generative phonology** *noun*
دەنگناسی زایا یان بەرهەم‌هێنەرانە ۞ آواشناسی زایشی
**generative process** *noun*
ڕەوت یان پرۆسەی بەرهەم‌هێنەر(انە) ۞ فرایند تولیدی
**generative semantics** *noun*
(زمانەوانی) واتاناسی زایا یان بەرهەم‌هێنەرانە ۞ معناشناسی زایشی
**generator** /'dʒenəreɪtə(r)/ *noun*
1 بەرهەم‌هێنە، پێکهێنەر، کۆمپانی دەزگای بەرهەم‌هێنانی وزەی ئێلیکتریسیتە، داینەمۆ: *the UK's major electricity generator* 2 دەزگای بەرهەم‌هێنان یان پێکهێنانی هەڵم، گاز و هتد 3 داهێنەر ۞ 1 مولد 2 ماشین تولیدکنندەی بخار، گاز و... 3 مبتکر
**generic** /dʒə'nerɪk/ *adjective, noun*
1 گشت، ناتایبەتی، گشتی، گشتگرەوە، هەمەکی، بۆ هەموو، بۆ گشت، تێکرایی: *'Vine fruit' is the generic term for currants and raisins* ◊ *generic restaurants* 2 ناوی گشت(ی)، گشتەنێو 3 (زیندەناسی) سەربە ڕەگەز یان توخم، توخمی، ڕەگەزی 4 (کەلوپەل ب.ت. داودەرمانی پزشکی) گشتی، بێ‌دروشم، بێ‌نیشان: *The doctor offered me a choice of a branded or a generic drug* ◊ *generic drugs* ۞ 1 عام، کلی، عمومی 2 اسم عام 3 وابستە بە جنس 4 (بازرگانی) ژنریک
**generically** /dʒə'nerɪkli/ *adverb*
بە گشتی، گشت ۞ بە طور عمومی
**generic category** *noun*
بابەتی گشتی ۞ مقولەی عام
**generic existence** *noun*
بوونی گشتی ۞ وجود عام
**generic noun** *noun*

(زمانەوانی) ناوی رەگەز، نێوی زایەند ۞ اسم جنس

**generic term** *noun*

ناوی گشت(ی)، گشتەنێو ۞ اسم عام

**generosity** /ˌdʒenəˈrɒsəti, US -ˈrɑːs-/ *noun, pl.* generosities

1 دلاوایی، بەخشندەیی، بەدەهندەیی، بەرچاوتێری، دەس‌کراوەیی 2 لێبوردەیی 3 جوامێری، دڵگەورەیی، پیاوەتی، مرۆیی 4 زۆری، زەبەنی ۞ 1 سخاوت، کرم، رادمردی 2 عفو 3 بلندنظری 4 فور

**generous** /ˈdʒenərəs/ *adjective*

1 دلاوا، بەدەهندە، (بەر)چاوتێر، بەخشندە، دەس‌کراوە، نانبدە، چاوتێرانە، دلاوایانە 2 لێبوردە، بەخشندە 3 دڵگەورە، پیاوچاک، گەورە، جوامێر 4 زۆر، زەبەن ۞ 1 سخاوت‌مند، سخاوت‌مندانە 2 باگذشت 3 بلندنظر 4 وافر

**generously** /ˈdʒenərəsli/ *adverb*

1 زۆر، گەلێ: *a dress that is generously cut* 2 دلاوایانە، بەخشندانە، بەرچاوتێرانە، دەس‌کراوانە ۞ 1 بسیار 2 از روی بخشندگی

**generousness** /ˈdʒenərəsnəs/ *noun*

1 دلاوایی، بەخشندەیی، بەدەهندەیی، بەرچاوتێری، دەس‌کراوەیی 2 لێبوردەیی ۞ 1 بخشندگی 2 گذشت

**genesis** /ˈdʒenəsɪs/ *noun*

1 سەرەتا، دەسپێک، بەرایی 2 پێکهاتن، پەیدابوون، سازبوون، دروس‌بوون، هاتنەدی 3 بنەما، ماک، ئاخێزگە، سەرچاوە، ژێدەر: *the genesis of a new political movement* 4 (Genesis) یەکەمین بەش لە کتێبی پیرۆز سەربە پەیمانی کۆن Old Testament کە باسی دروس‌بوونی دنیا دەکا ۞ 1 آغاز 2 تکوین، خلقت 3 منشا، خاستگاه 4 (Genesis) سفر تکوین یا پیدایش

**genet**[1] /ˈdʒenɪt/ *noun*

گواندارێکی پشیلەئاسای شەوگەڕ، پێ‌کوڵ و کلک‌درێژی قەفاوی، لە ئەفریکا، شامات و باشووری رۆژاوای ئەورووپا ۞ ژنت

**genet**[2] /ˈdʒenɪt/ *noun*

ئەسپی سپانیۆلی چکۆلانە ۞ ژنت

**gene therapy** *noun*

چارەسەرکردن بە رێگای ژێنەوە ۞ ژن‌درمانی

**genetic** /dʒəˈnetɪk/ *adjective,* also genetical

1 سەربە بۆماوە، بۆماوەیی یان ژێنێتیک: ◊ *genetic and environmental factors* 2 نژادەیی، سەربە بۆهێڵەکان، سەربە ژێنەکان ۞ 1 وابستە بە ژنتیک 2 وابستە بە ژن‌ها

**genetically** /dʒəˈnetɪkli/ *adverb*

بۆماوەیی‌یانە، لەباری بۆماوەیی یا ژێنێتیکی‌یەوە: ◊ *genetically determined/transmitted* ۞ از لحاظ ژنتیکی ◊ *genetically engineered*

**genetically modified** *adjective,* also GM

لەباری ژێنێتیکی‌یەوە دەسکاری‌کراو ۞ تعدیل‌شده از لحاظ ژنتیکی

**genetic code** *noun*

کۆدی بۆماوەیی، کۆدی ژێنێتیکی ۞ رمز ژنتیکی

**genetic engineer** *noun*

ئەندازیاری بۆماوە یان ژێنێتیک، ئەندازیار لە بواری بۆماوە یان ژێنێتیکدا ۞ مهندس ژنتیک

**genetic engineering** *noun*

ئەندازیاریی بۆماوەیی یان ژێنێتیک (زانستی گۆڕینی ژێنی گیانەوەر و رووەکەکان) ۞ مهندسی ژنتیک

**genetic fingerprinting** *nound*

جێ‌پەنجەهەڵگرتنەوەی ژێنێتیکی (پرۆسەی تاقی‌کردنەوەی نموونەی ژێنی کەسێ بە مەبەستی دۆزینەوەی تاوانکاران) ۞ انگشت‌نگاری ژنتیکی

**geneticist** /dʒəˈnetɪsɪst/ *noun*

ژێنێتیکەوان، پسپۆری ژێنێتیک، بۆماوەناس؟ ۞ متخصص ژنتیک

**genetics** /dʒəˈnetɪks/ *noun, pl.*

1 بۆماوەناسی، زانستی ژێنێتیک 2 تایبەتمەندی‌یەکانی زیندەوەر یان ئۆرگانیزمێ ۞ 1 علم وراثت یا ژنتیک 2 ویژگی‌های یک ارگانیسم

**Geneva Bands** *noun, pl.*

دوو بەنۆکەی سپی کە لە ملیوانی کراسی هێندێ پرۆتێستانت شۆڕ دەبێتەوە (گالڤینیستەکان لە ژێنێف لێیان دەدا) ۞ ژنو باندز

**Geneva convention** /dʒəˌniːvə kənˈvenʃn/ *noun*

پەیمان‌نامەی ژێنێف ۞ میثاق ژنو

**Geneva cross** *noun*

خاچی سوور، هەروەها Red Cross (لە پەسندکرانی‌یەوە لە لایەن پەیمان‌نامەی ژێنێف Geneva convention) ۞ صلیب احمر

**Geneva gown** *noun*

جبە یا عەبای ژێنێف (جلی فەرمی قەشەکانی پرۆتێستانت) ۞ عبای ژنو

**Genevan** *noun, adjective*

*n* ژێنێفی، خەڵکی ژێنێف *adj* سەربە ژێنێف لە سویس؛ سەربە گالڤنیزم Galvinism ۞ *n* اهل ژنو، ژنوی *adj* وابستە بە ژنو؛ وابستە بە گالوینیسم

**genever** /dʒɪˈniːvə/ *noun*

جینی هۆلەندی ۞ ژنور

**Genghis Khan** /ˌgeŋgɪs ˈkɑːn, ˌdʒeŋgɪs ˈkɑːn/ *noun*

کەسێ کە یەکجار زۆردار و و لە باری بۆچوونی رامیاری‌یەوە یەکجار راست‌ڕەوە: *He has a reputation as the Genghis Khan of the*

*Her politics are somewhere ◊ department* (بنەڕەت: لە *to the right of Genghis Khan* ناوی چەنگیزخان، ئیمپراتۆری مەنگۆلیا) ◌ چنگیزخان

**genial**[1] /ˈdʒiːniəl/ *adjective*
1 ڕووخۆش، لەدڵەونزیک، گەرموگوڕانە، دۆستانە، خۆشەویستانە، بەمحیبەت، دڵسۆز، دڵنەرم 2 (هەوا) خۆش، گەرم، باش، گونجاو، لەبار، نەرم ◌ 1 خوش‌مشرب، صمیمانه، دوستانه 2 مساعد، ملایم

**genial**[2] /ˈdʒiːniəl/ *adjective*
(توێکاری) چەناگەیی ◌ وابسته به چانه

**geniality** /ˌdʒiːniˈæləti/ *noun*
1 ڕووخۆشی، گەرموگوڕی 2 لەباربوون، باش‌بوون 3 خۆشی ◌ 1 خوش‌مشربی 2 مساعد بودن 3 مطبوعیت

**genially** /ˈdʒiːniəli/ *adverb*
ڕووخۆشانە، بە ڕووخۆشی‌یەوە: *to smile genially* ◌ با خوش‌مشربی

**genic** *adjective*
(زیندەناسی) بۆماوەیی، زگماکی، سکماکی‌یانە (*genically adv*) ◌ وراثتی

**-genic** *suffix*
پاشگر: 1 بەرهەم‌هێنەر، پێکهێنەر، پێکهاتوو بەهۆی: *carcinogenic* ،*carcinogenic* ،*biogenic* 2 گونجاو بۆ: *telegenic* (بنەڕەت: لە *-gen* + *-ic*) ◌ پیوند، 1 تولیدکننده، تشکیل‌دهنده، تشکیل‌شده با 2 مناسب برای

**geniculate** /dʒɪˈnɪkjulət/ *adjective*, also **geniculated**
ئەژنۆدار، چۆکدار، چەماو، نووشتاو، داهاتوو ◌ دارای زانو، خمیده

**geniculation** /dʒɪnɪkjuˈleɪʃn/ *noun*
1 ئەژنۆ، چۆک، زرانی 2 نووشتانەوە، چەمانەوە، چەماوی، داهاتنەوە ◌ 1 زانو 2 خمیدگی

**genie** /ˈdʒiːni/ *noun, pl.* genii /ˈdʒiːnɪʌɪ/ or genies
(لە چیرۆکە کۆنە عەرەبی‌یەکاندا) جنۆکە، جن ◌ جن

**genii** /ˈdʒiːniːaɪ/ *noun*
جنۆکەکان، ئەجنە، ئەوانگەل ◌ اجنه

**genip** /gɛˈnɪp/ *noun*, also juinep
بەری دارێکی گەرمێنانی ئەمریکایە کە دەخورێ ◌ جنیپ

**genipapo** /ˌdʒɛnɪˈpapəʊ/ *noun*, also genipap /ˈdʒɛnɪpap/
1 دارێکی گەرمێنانی ئەمریکا، بەرەکەی بۆ هەزوێلەی ناو خواردنەوە و دروست‌کردنی ڕەنگی ڕەشی بەکاردێت [*Genipa americana*] 2 خواردنەوە، ڕەنگی ڕەش یان هەزوێلەیێ کە لەو دارە دروست دەبێ ◌ جنیپاپو

**genistein** *noun*
ژێنیستەین: ئیزۆفلاڤۆنێ *isoflavone* $C_{15}H_{10}O_5$ ب.ت. لە دانی سۆیادا *soybean* دۆزراوەتەوە ◌ جنیستین

**genital** /ˈdʒenɪtl/ *adjective*
زاوزێیی، سەربە ئەندامە زاوزێیی‌یەکان ◌ تناسلی، وابسته به اعضا تناسلی

**genitalia** /ˌdʒenɪˈteɪliə/ = genitals

**genital organs** *noun, pl.*
ئەندامە زاوزێیی‌یەکان (هی دەرەوە) ◌ اندام‌های تناسلی

**genitals** /ˈdʒenɪtlz/ *noun, pl.*
ئەندامە زاوزێیی‌یەکان (هی دەرەوە) ◌ اعضا تناسلی

**genitive** /ˈdʒenətɪv/ *noun, adjective*
*n* (ڕێزمان) دۆخی دراوەپاڵ، دۆخی خاوەنداری یان هەبوون، دۆخی خاوەنایەتی *adj* دراوەپاڵ، خاوەنایەتی، خاوەنداری (بڕوانە *ablative*، *dative*، *genetive*، *nominative* و *vocative*) ◌ *n* حالت اضافی یا مالکیت *adj* اضافی یا ملکی

**genitor** /ˈdʒɛnɪtə/ *noun*
باوکی زیندەناسی‌یانەی کەسێ (بەرامبەری *pater*) ◌ جنیتور

**genito-urinary** /ˌdʒɛnɪtəʊˈjʊərɪn(ə)ri/ *adjective*
زاوزێیی و میزی: *genitourinary disorders* ◌ تناسلی و بولی

**geniture** /ˈdʒɛnɪtʃə/ *noun*
بوون، لەدایک‌بوون، پەیدابوون، *nativity*، *birth* ◌ تولد

**genius** /ˈdʒiːniəs/ *noun*
1 هەڵکەوتەیی، هۆشی لەڕادەبەدەر، توانایی، توانایی داهێنەرانە، بەهرە 2 هەڵکەوتوو، بلیمەت، شارەزایی یان توانایێکی تایبەتی، شارەزا، پسپۆر: *a statesman of -nius* 3 تایبەتمەندی، ڕەوشت 4 فریشتە یان گیانی پارێزەر (کەس یان شوێنێ) ◌ 1 نبوغ، استعداد 2 نابغه، خبره، مهارت یا استعداد ویژه، متخصص 3 ویژگی 4 روح محافظ

**genius loci** /ˈləʊsʌɪ, US ˈlɒkiː/ *noun*
(لاتین) ڕەنگ‌وبۆی لاخۆیی ◌ صبغه‌ی محلی

**genned up** *adjective*
(نافەرمی) ئاگادار، بەئاگا ◌ باخبر

**geno-** = gen-

**genoa** /ˈdʒɛnəʊə, dʒɛˈnəʊə/ *noun*, also genoa jib
(دەریاوانی) جۆرێ بادەوەی سێ‌سووچی *jib* گەورە یان بادەوەی سینە *foresial* کە لەگەڵ شابادەوە *mainsail* تێکەڵ دەبێ، ب.ت. بۆ پێش‌برکێ بەکاردێتێ (بنەڕەت: *Genoa*، شار و بەندەرێکی باکووری ڕۆژاوای ئیتالیا) ◌ ژنوآ

**Genoa cake** *noun*

*adj* 1 سەربە ناسینی هەناوەکی، ناستیک، سەربە نۆسیس 2 (Gnostic) سەربە گنۆستیسیزم *n* (Gnostic) گنۆسی، لایەنگری گنۆستیسیزم (gnostically *adv*) ۞ 1 وابسته به معرفت باطنی 2 (با G) وابسته به گنوستیسسم *n* (با G) گنوسی

**Gnosticism** /ˈnɒstɪˌsɪz(ə)m/ *noun*

ریبازی گنۆسی، گنۆستیسیزم: بزووتنەوەیێکی جیاباوەڕانەی کلێسەی کریستانیەتی سەدەی دووهەم یان ئەو بیر و کردەوانەی ب.ت. چەندین تیرە و کالتی سەرەتای (سەدەکانی) کریستانیەت کە ئامۆژگاری‌یەکانی لەسەر ئەم بنەمایە کە زانست یان زانیاری رازمەندی یەزدانی بەرز دەتوانێ رۆحی مرۆڤ رزگار بکا (یان پێی وابوو کە مایە یان مادە بەد و خراپ بوو و نکۆلی لەوەش دەکرد کە کریست بوونێکی تەنی و لەشی سروشتی هەبووە) ۞ گنوستی‌سیسم، مذهب گنوسی، فلسفەی ادریە

**gnotobiotic** /ˌnəʊtə(ʊ)bʌɪˈɒtɪk/ *adjective*

(زیندەوەرناسی) ناسینژی: ئاماژە یان سەربە ژینگەیێ کە لەودا تێکرای وردەزیندەوەرەکان هەم ناسراون و راگیراون؛ هەروەها axenic (gnotobiosis or gnotobiotics *n*) (زانستی بەخێوکردن یان پەروەراندنی گیانەوەرانی توێژینگەیی کە میکرۆبە رووەکی و گیانەوەری‌یەکانی بە تەواوەتی ناسراون؛ (gnotobiotically *adv* ۞ شناخت‌زی

**GNP** /ˌdʒiː en ˈpiː/ *abbreviation* gross national product

بەرهەمهێنانی ناپوختی نەتەوەیی، بەرهەمهێنانی تێکڕایی نیشتمانی ۞ تولید ناخالص ملی

**GnRH** *abbreviation* gonadotropin-releasing hormone

گۆنادۆترۆپینێ کە هۆرمۆن ئازاد دەکا؛ هۆرمۆنی بەرهەمهاتوو بەهۆی هیپۆتالاموس hypothalamus کە تاوی pituitary gland دەدا بۆ دەردانی FSH و LH ۞ جی‌ان‌آرهاش

**gnu** /(g)nuː, US (g)njuː/ *noun*, wildbeest

ئاسکەکێوی ئەفریکایی، گاکێوی ئەفریکایی: سەری درێژ و بە ریش و یالەوە [توخم *Connochaetes*: دوو جۆرن] ۞ گوزن افریقایی

**GNVQ** /ˌdʒiː en viː ˈkjuː/ *abbreviation* General National Vocational Qualification

خولێکی لێکۆلینەوەی خوێندکارانی تەمەن18ـ15 تا ئامادە بن بۆ دامەزران یا زانکۆ ۞ جی‌ان‌وی‌کیو

**go** /gəʊ, US goʊ/ *noun*

1 هێزی رۆیشتن، جمۆجۆل، گورجی، وزە، هەلسووڕان، چالاکی، بەگوڕی، بەگوژمی، وزە، گوژم، تەوژم، تینوگوڕ، تامەزرۆیی: *Mary's always got plenty of go* 2 رووداو، بوویەر، قەومین 3 حەول، تێکۆشان، بزاڤ 4 نۆبە، نۆرە، جار، کەشە، چین 5 (پزشکی) لێهاتن، گرتن 6 مۆد یان باوی رۆژ، بابەتی رۆژ ۞ 1 نیروی رفتن، جنب و جوش، فعالیت، اشتیاق 2 حادثه 3 سعی 4 نوبت، بار 5 حمله 6 مد روز

**goad** /gəʊd, US goʊd/ *noun*

1 نەقیزە، مەساسە، لاپتە، دەرزیک، مامزە، مامێزە 2 هاندەر، پاڵنەر، بزوێنەر، spur، motive: *The offer of economic help is intended to act as a goad to political reform* ۞ 1 سیخونک، مهمیز 2 محرک

**goadsman** /ˈgəʊdzmən/ *noun, pl.* goadsmen

گاوان ۞ گاوران

**go-ahead** /ˈgəʊd əhed/ *noun, adjective*

*n* دەستوور، رێدان، چرای سەوز: *The council has given the go-ead to start building* *adj* 1 چالاک 2 پێشکەوتوو، پێشەنگ: *a go-ahead company* ۞ *n* چراغ سبز *adj* 1 فعال 2 مترقی

**goal** /gəʊl, US goʊl/ *noun*

1 ئامانج، هیوا، ئاوات، هێڤی، مەبەست، ئارەزوو 2 (توپێن) گۆل 3 دەروازە، گۆلەچوارچێوە، چوارچێوک 4 (خوازە) شوێنمەبەست، جێگای چوون ۞ 1 هدف، آرمان 2 گل 3 دروازه 4 مقصد

**goal-area** *noun*

(توپێن) شوێن یان پانتایی شەش هەنگاوی ۞ محوطەی شش قدمی

**goalie** /ˈgəʊli, US ˈgoʊli/ = goalkeeper

**goalkeeper** /ˈgəʊlkiːpə(r), US ˈgoʊl-/ *noun*

دەروازەوان، گۆلپارێز، دەروازەپارێز ۞ دروازەبان

**goal kick** *noun*

گۆلکیک ۞ ضربەی کاشته

**goalless** /ˈgəʊlləs, US ˈgoʊl-/ *adjective*

(پێشبڕکێی توپێن) بێگۆل ۞ بدون گل

**goal line** *noun*

(توپێن، هاکی و هتد) هێلی گۆل، هێلی دەروازە ۞ خط دروازه

**goalmouth** /ˈgəʊlmaʊθ, US ˈgoʊl-/ *noun*

پێشەوەی دەروازە، پێش‌گۆل، دەمی دەروازە ۞ جلوی دروازه

**goalnet** /ˈgəʊlnet/ *noun*

تۆڕی دەروازە، تۆڕی گۆل ۞ تور دروازه

**goalpost** /ˈgəʊlpəʊst, US ˈgoʊlpoʊst/ *noun*

کۆلەکە یان ستوونی دەروازە ۞ تیر دروازه

**goalscorer** /ˈgəʊlskɔːrə(r), US ˈgoʊl-/ *noun*

(توپێن) گۆلچی، گۆلکار، گۆللێدەر، گۆلکەر ۞ گول‌زن

**goaltender** /ˈgəʊltendə(r), US ˈgoʊl-/ = goalkeeper (especially in ice hockey)

**goanna** /gəʊˈanə/ = monitor lizard,

Australian

**go-around** *noun*

(نافـــەرمی و ئـــەمریکا) رووبەڕووبوونـــەوە، مشـتومڕ ۞ مواجهه، جر و بحث

**go-as-you-please** *noun*

بەرەلا، گەڕال، ئازاد، وێڵ ۞ ول، بی‌قید

**goat** /gəʊt, US goʊt/ *noun*

1 بـزن [*Capra hircus*]؛ جـۆری گـوان‌داری کێوی کە پێوەندی بە بزنەوە هەیە، وەک ibex، markhor و tur 2 (نافەرمی) پیرەپیاوی بەئالۆش، پیرکوونی 3 (بریتانیا و نافەرمی) مرۆی گەوج 4 (ئەمریکا و نافەرمی) قۆچی قوربانی، بەلاگێڕەوە ۞ 1 بز 2 پیرمرد حشری 3 آدم احمق 4 سپربلا

**goat-antelope** *noun*

جـۆری بزنـەکێوی [ژێرخێـزان Caprinae] ۞ نوعی بزکوهی

**goatee** /gəʊ'ti:, US goʊ-/ *noun*

ریش‌بزنی، ریش‌چەناگەیی ۞ ریش پروفـوری

**goateed** /gəʊ'ti:/ *adjective*

بە ریشی بزنی‌یەوە، ریش‌بزنی، ریـش‌چەناگەیی ۞ با ریش پروفـوری

**goat-fig** /'gəʊt fɪg/ *nonu*

(رووەک‌ناسی) هەنجیری کێوی ۞ انجیر وحشی

**goatfish**, *pl.* same or goatfishes = red mullet (North American)

**goatherd** /'gəʊthɜ:d, US 'goʊthɜ:rd/ *noun*

شوان، بزنەوان، شوانی بزن، بزن‌لەوەڕێن ۞ بزچران

**goatish** *adjective*, also goaty

1 بەئالۆش، زەنەک، خوونک، شەهوانی 2 بزنی، بزن‌ئاسا، بزنەکی، شێوەبزن ۞ 1 شهوانی 2بزمانند

**goatishly** *adverb*

بەئالۆشانە، بە شێوەیێکی شـەهوانی ۞ بـە طـور شهوانی

**goatishness** *noun*

بەئالـۆش‌بـوون، شـەهوانی‌بـوون، بەئالۆشـێتی ۞ شهوانیت

**goatling** *noun*

بزنی یەک‌بەهار یا دووبەهارە، گیسک ۞ گوتلینگ

**goat moth** *noun*

پەپوولە(شەوگەڕ)بزنە: بۆنی بزن دەدا [*Cossus cossus*] ۞ نوعی پروانه

**goat-root** 'gəʊt ru:t/ *noun*

(رووەک‌ناسی) ریشـەبزنە؟: جۆری گیا ۞ عجرم

**goat's beard** 'gəʊts bɪəd/ *noun*

1 شـنگ، ئەسـپینگ salsify 2 جـۆری رووەکـی dandelion ئاسـا [*Tragopogon pratensis*] 3 ریش‌بزنە: جۆری رووەکی گوڵسپی [*Aruncus dioicus*] 4 ریشی بزن ۞ 1 شنگ 2 و 3 نـوعی گیاه 4 ریش‌بز

**goat's cheese** *noun*

پەنیری بزن ۞ پنیر بز

**goatskin** /'gəʊtskɪn, US 'goʊt-/ *noun, adjective*

*n* پێستی بزن، کەوڵی بزن، چەرمی بزن، تیمـانج، تیماج *adj* لە تیماج، لە کەوڵی بزن ۞ *n* پوست بز، تیماج *adj* تیماجی

**goatsucker** = nightjar

**go-away bird** *noun*

جـۆری باڵـندەی پۆرنـەی کلـک‌درێژی و زۆرتـر بـۆری ئـەفریکایی [*Corythaixoides concolor* و جۆرەکانی تر] ۞ نوعی پرنده

**gob**[1] /gɒb, US gɑ:b/ *noun*

1 (تف و هتد) تۆپـەڵ، تەختـەتف 2 بڕێکی زۆر، لۆدە، کۆما ۞ 1 لخته، تخته‌تف 2 مقدار زیاد

**gob**[2] /gɒb, US gɑ:b/ *noun*

(نافـەرمی، بـۆ سـووکایەتی) دەم، زار، کنکەکـەر ۞ دهن

**gob**[3] /gɒb, US gɑ:b/ *noun*

(نافەرمی) مەلەوانی ئەمریکایی ۞ ملاح امریکایی

**gobbet** /'gɒbɪt, US 'gɑ:b-/ *noun*

1 پارچە، کوت، لەت، قاش، تیکە، پاروو 2 لەتـە گۆشت 3 بڕێکی کەم 4 (لە دەقێ) کورتـە ۞ 1 قطعه 2 قطعه‌ی گوشت 3 مقدار اندک 4 چکیده

**gobble** /'gɒbl, US 'gɑ:bl/ *noun*

قارەقاڕ، قاسپەقاسپ، دەنگی بۆقلە ۞ غات غات

**goobledegook** /'gɒbldigu:k, US 'gɑ:bl-/ *noun*, also goobledygook

(نافـەرمی) زمـانی تـەق‌وڕەق، جـارگۆن، زمـانی ئالۆز ۞ زبان پیچیده

**gobber** *noun*

1 نێرەقەل، قەلەنێر 2 زۆرخـۆر ۞ 1 بوقلمون نـر 2 پرخور

**Gobelin** *noun*

گوبێلین: سـەربەو پەردەنەخـشینانە tapestry کـە لە گوبێلینی پاریـس لە فـەڕەنـسە دەهاتـە بـەرهـەم ۞ گوبلین

**go-between** /'gəʊ bɪtwi:n/ *noun*

دەلال، نێوبژیکـار، نێـوان‌ڕێکخـەر، نێوگژیـوان، ناقبەر ۞ میانجی

**gobi** /'gəʊbi/ Indian = cauliflower, cabbage

**goblet** /'gɒblət, US 'gɑ:b-/ *noun*

مەیخۆری (پایەدار)، پیاڵـە، کۆتـک، جـام، کاسـە (بێ‌دەسـک یا قوڤل) ۞ گیلاس شراب‌خوری، جام

**goblin** /'gɒblɪn, US 'gɑ:b-/ *noun*

جنۆکە، دەعبا، جن ۞ جن

**gobo**[1] /'gəʊbəʊ/ *noun, pl.* gobos

پەردە: 1 پەردەیێ بۆ پاراسـتنی لێنز یان هاوێنە لە شـەوق یـان مـایکرۆفۆن لـە دەنـگ 2 (تیـاتر) پـەردەیـێ بـۆ پاراسـتنی فـیلم یـان دووربـینی تەلەفزیۆن لە تیشـک یان شەوق ۞ گوبو

**gobo**[2] /'gəʊbəʊ/ *noun*

شـتێکی سێ‌گـۆشی دەخرێتـە نێـو کراسـەوە (بـۆ جوانی یان پری) ◌ گودت

**godetia** /gə(ʊ)'di:ʃə/ *noun*

جـۆرێ گیـای ئـەمریکای بـاکووری [تـوخم *Godetia* یـان *Clarkia*] (بنـەڕەت: لـە نـاوی رووەکناسـی سـویدییەوە Charles H. *Godet*) ◌ نوعی گیاه

**go-devil** *noun*

(ئەمریکا) لوولەسڕ ◌ لوله‌پاک‌کن

**god-father** /'gɒdfɑ:ðə(r), US 'gɑ:d-/ *noun*

باوکی تەوفن‌کراو یان تەعمیدی ◌ پدر تعمیدی

**god-fearing** /'gɒd fɪəɪŋ/ *adjective*

لەخواترس، خواناس، پارێزگار، بەرماڵ‌بەشان ◌ پارسا، زاهد

**godforsaken** /'gɒdfəseɪkən, US 'gɑ:dfər-/ *adjective*

1 شـوێنی دڵـتەنگ، جەهەنم، چۆڵـگە، کـەلاوە، وێرانـە: *I can't stand living in this godforsaken hole* 2 بەدبەخت، بێچارە، کڵۆڵ ◌ 1 متروکه 2 بخت‌برگشته

**God-given** *adjective*

خـوادراوە، خواپێداو، خـواکرد: *a God-given talent* ◌ خدادادی

**godhead** /'gɒdhed, US 'gɑ:d-/ *noun*

1 خودایەتی، خودایی، یەزدانێتی، سروشتی خوایی 2 خودا، یەزدان ◌ 1 الوهیت، ربانیت 2 ایزد

**god-intoxicated** *adjective*

مەسـتی خودا، سەرمەستی یەزدان ◌ مست خدا

**godless** /'gɒdləs, US 'gɑ:d-/ *adjective*

بێ‌خودا، بێ‌دین، دینەدر، خودانەناس: *a godless generation/world* ◌ بی‌خدا، لامذهب

**godlessness** /'gɒdləsnəs, US 'gɑ:d-/ *noun*

بێ‌خـودایی، بێ‌دینی، دینـدری، خودانەناسی ◌ بی‌خدایی، لامذهبی

**godlike** /'gɒdlaɪk, US 'gɑ:d-/ *adjective*

خودایانـە، خوائاسـا، خـوایی، ئاسمـانی: *his godlike beauty* ◌ خداوار، الهی، ملکوتی

**godliness** /'gɒdlinəs, US 'gɑ:dlinəs/ *noun*

لەخوداترسـی، خـودابینی، دینـداری، بـەدینی، پارێزگاری، خواناسی ◌ پارسایی، پرهیزکاری

**godly** /'gɒdli, US 'gɑ:dli/ *adjective* (godlier, godliest)

خواناس، دینـدار، بـەدین، خـودابین، بـەئیمان، لەخوداترس، پارێزگار ◌ پارسا، متقی، پرهیزکارانه

**godmother** /'gɒdmʌðə(r), US 'gɑ:d-/ *noun*

دایکی تەوفن‌کراو یان تەعمیدی ◌ مادر تعمیدی

**godown** /'gəʊdaʊn, US 'goʊ-/ *noun*

(لـە ئاسـیا ب.ت. هێنـد) عـەمار، هەڵـگرتنگا، جێگای هەڵگرتن، کۆمگە، کۆگا ◌ انبار

(ژاپۆنی) ڕەگی و ڕیشەی سەوزی، لە ئاشپەزی ڕۆژهەڵاتدا ◌ گوبو

**gobshite** /'gɒbʃʌɪt/ *noun*

(ئیرلەند و سووکانە) مرۆی گەوج و سووک ◌ آدم احمق و پست

**gobsmacked** /'gɒbsmækt, US 'gɑ:b-/ *adjective*

سەرسـووڕماو، سەرسام، واق‌وڕماو، تاسـاو ◌ متحیر، شگفت‌زده

**gobstopper** *noun*

(بریتانیا) جـۆرێ شیرینی یان نوقڵی گـەورەی خڕی ڕەق ◌ گوب‌ستاپر

**goby** /'gəʊbi/ *noun*, *pl.* gobies

1 ماسـیێکـی دەریـایی چکۆڵـە [خێـزان Gobiidae: زۆر جـۆرن] (بنەڕەت: لە *gobius* لاتین، لە *kōbios* یۆنانییەوە) 2 لاتراسکە ◌ 1 نوعی ماهی 2 گوبی

**go-by** /gəʊ 'baɪ/ *noun*

1 تەکێنـەوە، پرینگانـەوە، خـۆدوورگرتن 2 لاتراسکە ◌ 1 اجتناب 2 گوبی

**go-cart** /'gəʊ kɑ:t/ *noun*

1 ئەسـپەدارینە، منداڵـبەرە، کالیسـکەی منـاڵ، ڕەوڕەوە، پێچۆک 2 فەڕغوون، دەستەبەر ◌ 1 کالـسکەی بچه، روروک 2 چرخ دستی

**God** /gɒd, US gɑ:d/ *noun*, *interjection*

*n* 1 کردگـار، خـودا، خواوەنـد، خـوا، خـودێ، حەق، گیانی گیانان، بینایی چاوان 2 (god) خوا، خودا، خێو، یەزدان، ئێزەد 3 (خوازە) بت، خودا *interj* ئـەی خـودا، خوایـە (بنـەڕەتی ئـەڵمانی هـەیـە) ◌ *n* 1 خـدا، خداونـد 2 (god) خـدا، رب‌النوع 3 بت *interj* خدای من

**god-awful** *adjective*

زۆرناخۆش، یەکجار خراپ ◌ بسیار بد

**godchild** /'gɒdtʃaɪld, US 'gɑ:d-/ *noun*

منـاڵ یـان فرزەنـدی تـەوفن‌کـراو (یـان سـەران‌شۆکراو) ◌ فرزند تعمیدی

**goddam** /'gɒddæm, US 'gɑ:d-/ *adjective*, *adverb*, also goddamned /'gɒddæmd, US 'gɑ:d-/

گـووە، گووبەتێو، بەزیادنەبوو، گڵاو: *Where's that goddamned pen?* ◌ نکبتی، کثافت

**goddammit** *interjection*

خوا بتگرێ! ◌ لعنتی!

**god-daughter** /'gɒd dɔ:tə(r)/ *noun*

کچـی تـەوفن‌کـراو، کچـی تەعمیـدی (یـان سەران‌شۆکراو) ◌ دختر تعمیدی

**goddess** /'gɒdes, -əs, US 'gɑ:dəs/ *noun*

1 خـواژن، خێـوی ژن، خوابـانوو، بـانووخوا: *Diana, the goddess of hunting* 2 (خـوازە) بت: *a screen goddess* ◌ 1 الهه، ایزدبانو 2 بت

**godet** /gəʊ'dɛt, 'gəʊdeɪ/ *noun*

**godparent** /ˈgɒdpeərənt, US ˈgɑ:dperənt/ *noun*
دایک و باوکی تەوفن‌کراو، باوانی تەعمیدی ◌ پدر یا مادر تعمیدی

**godroon** = gadroon

**the gods** *noun, pl.*
(لــە شــانۆ) پــشتەوە یــان دواوەی هــۆڵ، کورسی‌یەکانی پشتەوەی هۆڵ ◌ عقب سالن

**God Save the Queen (or King)** *noun*
سرودی نیشتمانی ئینگلتەرە ◌ سرود ملی انگلستان

**godsend** /ˈgɒdsend, US ˈgɑ:d-/ *noun*
خــوانێردە، خواپێــداوە، شــتی باشــی چاوەڕواننەکراو ◌ موهبت الهی

**godship** *noun*
خودایی، خودایەتی ◌ الوهیت

**godson** /ˈgɒdsʌn, US ˈgɑ:d-/ *noun*
کوڕی تەوفن‌کراو یان تەعمیدی ◌ پسر تعمیدی

**godspeed** /ˈgɒdspi:d/ *interjection, noun*
خوات لەگەڵ، بە ئەمانی خودا ◌ خدا نگهدار

**God's truth** *noun*
ڕاستی تەواو یان ڕەها ◌ حقیقت مطلق

**God willing** *interjection*
خوا حەزکا، ئینشەلا ◌ انشاءالله

**godwit** *noun*
(باڵندەناسی) جۆرێ wader زلەی لاق‌درێژ، بە دەنووکێکی درێژی ڕاست یان کەمێ خوار [توخم *Limosa*: چوار جۆرن] ◌ نوعی پرنده

**-goer**
(لە لێکدانا) ـڕەو، ـڕۆ ◌ ـرونده، ـرو

**goer** /ˈgəʊə(r), US ˈgoʊər/ *noun*
1 ئاگرپارە، ئاتەش‌پارە، شەیتان 2 ژن یا کچێ کە پێخۆشە لەگەڵ پیاوان ڕابوێرێ، فێرەحاڵ ◌ 1 آتش‌پاره 2 اهل حال

**goes** = third person singular present of go

**Goethean** /ˈgɜ:tɪən/ *adjective*, also Goethian
سەربە هونەر و دراماتیستی ئەڵمانی یوهان وۆلفگانگ ڤۆن گوتە Johann Wlofgang von Goethe (1749-1832) ◌ گوته‌ای

**goethite** /ˈgɜ:tʌɪt/ *noun*
کانێکی قاوەیی مەیلەو زەرد یان ڕەش کە ئۆکسایدی ئاسنی ئاویتی hydrated تیایە ◌ نوعی معدن

**gofer** /ˈgəʊfə(r), US ˈgoʊ-/ *noun*, also gopher
بەردەس(ت) ◌ پادو

**goffer** /ˈgɒfə/ *noun*
ئاسنێ بۆ قەدپێدانی تۆڕ ◌ چین

**go-getter** *noun*
1 (نافەرمی) مرۆی بەرزەفڕ، مرۆی سەرکەوتن‌خواز 2 مرۆی کەڵەگا، ملهوڕ ◌ 1 آدم جاه‌طلب، آدم موفقیت‌خواه 2 آدم قلدر

**goggle** /ˈgɒgl/ *adjective, noun*
*adj* دەرپەڕیو، زەقەوەکردوو *n* سەرەگێژە (جۆرێ نەخۆشی مەڕ) ◌ *adj* درآمده *n* سرگیجه

**goggle-box** *noun*
(دەزگای) تەلەفزیۆن ◌ تلویزیون

**goggle-eye** *noun*
ماسی‌یەچاوزەقە [*Priacanthus hamrur* و goggle-eye ) *Selar crumenophthalmus* (jack] ◌ نوعی ماهی

**goggle-eyed** /ˈgɒgl aɪd/ *adjective*
چاوزەقەوەکردوو، چاوبزکردوو، چاودەرپەڕاندوو ◌ با چشمان زل‌زده

**goggles** /ˈgɒglz, US ˈgɑ:glz/ *noun, pl.*
چاوپارێز، چاویلکەی پاراستن (لە تۆز، با و ئاو) ◌ عینک ایمنی

**goggling** *adjective*
(چاو) زەق، دەرپەڕیو، ئەبلەق، بزەوەبوو ◌ زل‌زده

**go-go** /ˈgɔ:gɔ:/ *adjective*
1 (بەندە بە شێوازی سەماکردن بۆ موسیقای پاپ کە لەودا کچەکان شتێکی وایان لەبەردا نییە) ڕووت 2 چوونەسەرەوە و هەستانی کت‌وپڕ ◌ 1 گوگو 2 افزایش سرسام‌آور

**Goidelic** /gɔɪˈdelɪk/ *noun, adjective*
*n* گۆی‌دێلیک (کۆمەڵی باکووری زمانە سێلتی‌یەکان، کە بریتی‌یە لە ئیرلەندی، سکاتلەندی، گالیک Gaelic و مانکس Manx) *adj* سەربەو زمانانە ◌ گوی‌دلیک

**going** /ˈgəʊɪŋ, US ˈgoʊɪŋ/ *noun, adjective*
*n* 1 ڕۆیشتن، چوون، ڕەو، هەڕین، مەش 2 (خوازە) مردن، ڕۆیشتن 3 ڕەفتار، هەڵس‌وکەوت 4 ڕەوش، بارودۆخ، بارودۆخی ڕێگا، باری عەرز 5 خێرایی، پێشکەوتن، چوونەپێش، پێشڤەچوون *adj* 1 لەبەردەس، هەیی، بەردەس 2 (نرخ و هتد) ئێستا، هەنووکە 3 بەبرەو، گەشەسەندوو، بەرمێن ◌ *n* 1 عمل رفتن، مشی 2 مرگ 3 رفتار 4 وضع، وضع راه، وضع زمین 5 سرعت، ترقی *adj* 1 موجود 2 جاری 3 پررونق

**going-over** *noun*
1 تێڕوانینی ورد، لێکۆڵینەوە، لێکۆڵینەوەی ورد، پیاچوونەوە، دەس‌پیاگێران 2 دارکاری، کوتک‌کاری، مشت‌ومال، لێدان ◌ 1 بررسی دقیق، بازبینی، تعمیر 2 گوشمالی

**goings-on** /ˌgəʊɪŋz ˈɒn/ *noun*
(زۆرتر ناقانوونی، نائاسایی و سەیر) کەین‌وبەین، سیروتر، چالاکی‌یەکان، ڕووداوەکان، بوویەرەکان ◌ فعالیت‌ها، وقایع

**goitre** /ˈgɔɪtə(r)/ *noun*, also US goiter
زەریکە، گواتر ◌ گواتر

**goitrous** /ˈgɔɪtrəs/ *adjective*
تووش‌بوو بە زەریکە، گواترگرتوو ◌ مبتلا به

گواتر

**go-kart** /ˈgəʊ kɑːt, US ˈgoʊ kɑːrt/ *noun*
ماشینی پێشبڕکێ ۞ ماشین مسابقه

**go-karting** *noun*
پێشبڕکێی ماشینلێخوڕین، ماشینبڕکێ ۞ مسابقەی اتومبیل‌رانی

**Golconda** /gɒlˈkɒndə/ *noun*
سەرچاوەی سامان، کانگای دەوڵەمەند، خۆشی و بەختەوەری و پێشکەوتن (بنەڕەت: لە ناوی شارێکی نزیک بە Hyderabad هیند، بەناوبانگە بۆ ئەڵماسەکانی) ۞ منشأ ثروت، معدن غنی، سعادت و پیشرفت

**gold** /gəʊld, US goʊld/ *noun, adjective*
*n* 1 زێڕ (بە ژ.گ. 79، ن. Au) 2 پارە، پووڵ؛ ماڵ، دارایی، سامان 3 (پێشبڕکێ) میدالی زێڕ 4 ڕەنگی زەرد *adj* 1 (دروس‌کراو) زێڕکرد، زێڕکار 2 زێڕین، لە زێڕ 3 زەرد، (ڕەنگ) زێڕین ۞ *n* 1 طلا، زر 2 پول؛ ثروت 3 مدال طلا 4 رنگ طلایی *adj* طلایی

**goldbeater** /ˈgəʊldbiːtə(r)/ *noun*
زێڕکار، زێڕکوت ۞ طلاکوب

**goldbeating** /ˈgəʊldbiːtɪŋ/ *noun*
زێڕکاری، زێڕکوتی، زێڕکوتان ۞ طلاکوبی

**gold card** *noun*
کارتی زێڕین ۞ کارت طلایی

**goldcrest** *noun*
پۆپەزێڕینە؟، جۆرێ باڵندەی دەنگ‌خۆش، بە پۆپەی زەرد یان پرتەقاڵی دەورڕەشەوە [*Regulus regulus*] ۞ نوعی پرنده

**gold-digger** /ˈgəʊld dɪgə(r)/ *noun*
(نافەرمی) ژنێ کە بە خۆدەرخستن، پیاوانی دەوڵەمەن بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ ۞ گولددیگر

**gold disc** *noun*
پەپکەی زێڕین ۞ دیسک طلایی

**gold dust** /ˈgəʊld dʌst/ *noun*
خاکەزێڕ، هاڕاوەی زێڕ ۞ خاکەی طلا

**golden** /ˈgəʊldən, US ˈgoʊldən/ *adjective*
1 زێڕین، زێڕئاسا: *golden ◊ a golden crown* 2 تایبەتی، درەوشاوە: *golden memories* *hair* ۞ 1 طلایی، زرین 2 ویژە، درخشان

**golden age** *noun*
سەردەمی زێڕین ۞ عصر طلایی

**golden ager** *noun*
(ئەمریکا، جوان‌دەربڕی) کەسێکی پیر ۞ آدم سال‌خورده

**golden anniversary** = golden jubilee

**golden boy** *noun*
کوڕی زێڕین ۞ پسر طلایی

**golden chain** *noun*
دارپەپوولەی ئاسایی ۞ لابورنوم معمولی

**golden eagle** *noun*
هەڵۆی زێڕین، هەڵۆێکی زل؛ هی نیوەگۆی باکووری، پا، پشت، سەر و مل تووک‌زەرد، دەنووک‌بۆر [*Aquila chrysaetos*] ۞ عقاب طلایی

**goldeneye** *noun, pl.* same or goldeneyes
چاوزێڕینە، مراوی خولوورکەری باکووری کۆچەر، نێرەکەی سەری ڕەشە و چاوی زەردە [توخم *Bucephala*: دوو جۆرن] ۞ نوعی مرغابی

**Golden Fleece** *noun*
خوری زێڕین: برێ خوری لەزێر کە لە لایەن پادشای Colchis (مەڵبەندێکی کۆن لە باشووری دەریای ڕەش و چیاکانی کەوکاز، ئێستا بەشێکە لە ڕۆژاوای کۆماری Georgia) لە بێشەیێکی هەژدیهاپارێز دانرا و بە دەستی Argonaut ـەکان (یان پاڵەوانانی ئارگوناوت) دۆزرایەوە ۞ پشم طلایی

**golden girl** *noun*
کچی زێڕین ۞ دختر طلایی

**golden goal** *noun*
گۆڵی زێڕین ۞ گل طلایی

**golden handshake** *noun*
ئەو پارەیەی کە بە کەسێ دەدرێ کە کارەکەی بەجێ‌هێشتبێ ۞ پاداش پایان خدمت

**Golden Horde** *noun*
سپایی‌یانی مۆغوول کە ڕۆژهەڵاتی ئەورووپایان لە سەدەی سێزدەهەمدا دابووە بەر پەلامار و تا ساڵی 1486 دەسەڵاتیان بەسەر رووسیادا کرد ۞ گولدن هورد

**golden jubilee** *noun*
پەنجایەمین ساڵوەگەڕ، ئاهەنگ یان سووری پەنجایەمین ساڵیاد ۞ پنجاهمین سالگرد، جشن پنجاهمین سالگرد

**golden lion tamarin** *noun*
تامارینە شێرەزەردە [*Leontopithecus rosalia*] هی دارستانی گەرمێنان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی برێزیل ۞ نوعی میمون

**golden marguerite** *noun,* also yellow chamomile or golden camomile
(رووەک‌ناسی) گوڵەزەردە [*Anthemis tinctoria*] ۞ بابونەی زرد

**golden mean** *noun*
ڕادەی مام‌ناوەندی یان مەیانە، ڕادەی نێوەڕاست ۞ حد اعتدال

**golden nematode** *noun*
جۆرێ کرمی نیماتۆدی وردی زەردباو کە مێملی پەتاتەیە [*Globodera rostochiensis*] ۞ نوعی کرم

**golden plover** *noun*
بارانەزێڕینە، بارانەزەردە [توخم *Pluvialis apricaria*] ۞ نوعی پرنده

**golden rain tree** *noun*

داریکی ئاسیایی، هێشوودرێژ و بریقەداری گوڵزەرد [Koelreuteria paniculata] لە خێزانی [Sapindaceae] ◌ نوعی درخت
**golden raisin** = sultana
**golden retriever** *noun*
قەبە گوڵی تووکئەستووری زەرد ◌ نوعی سگ بزرگ
**goldenrod** *noun*
(رووەکناسی) میلزەردە؟: جۆرێ رووەک لە خێزانی daisy [توخم Solidago] ◌ نوعی گیاه
**golden rule** *noun*
ریسای بنەرەتی، یاسای زێڕین، بنەمای زێڕین، بنچینەی سەرەکی ◌ اصل اساسی، قاعدەی اصلی
**golden seal** *noun*
(رووەکناسی) جۆرێ گیای چەندساڵەی ئەمریکای باکووری لە خێزانی buttercup [توخم Solidago] ◌ نوعی گیاه
**golden share** *noun*
بەشی زێڕین (بەشێ لە کۆمپانییێ کە بە لای کەمەوە کۆنتڕۆلی سەدی 51 بەدەستەوەیە) ◌ سهم طلایی
**golden syrup** *noun*
جۆرێ تریکلی treacle پالێوراوی زەردی کاڵە ◌ نوعی ملاس
**golden trout** *noun*
کەشینەزەردە، کەشینەزێڕینە ◌ نوعی ماهی
**golden wedding** *noun*
پەنجایەمین ساڵوەگەڕی زەماوەند، ئاهەنگی پەنجایەمین ساڵیادی زەماوەند ◌ پنجاهمین سالگرد ازدواج، جشن پنجاهمین سالگرد ازدواج
**golden years** *noun, pl.*
ساڵەزێڕینەکان (هی تەمەنی کەسێ) ◌ سالهای طلایی
**gold-field** /'gəʊldfi:ld, US 'goʊld-/ *noun*
زێڕەلان، زێڕستان، زێڕان، ناوچەی زێڕلێهەڵکەوتوو ◌ منطقەی زرخیز
**gold-filled** /'gəʊld'fɪld/ *noun*
زێڕنیشان ◌ زرکوب
**goldfinch** /'gəʊldfɪntʃ, US 'goʊld-/ *noun*
1 (گیانەوەرناسی) سەیرەی زێڕین، زەنگوڵەمیرە [Carduelis carduelis (ئوراسیا)، C. tristis زەنگوڵەمیرەی ئەمریکایی] 2 (ئافەرمی) کۆینی زێڕ ◌ 1 سهرەی طلایی 2 سکەی زر
**goldfish** /'gəʊldfɪʃ, US 'goʊld-/ *noun, pl.* same or goldfishes
زەردەماسی، ماسییە زەردە، سوورەماسی، ماسی گۆلاو یان حەوز [Carassius auratus] ◌ ماهی قرمز
**goldfish bowl** *noun*
شووشەماسی ◌ تنگ ماهی
**goldilocks** /'gəʊldɪlɒks/ *noun*
1 کەسێکی قژکاڵ 2 رەبەنۆکی دارستان [Ranunculus auricomus] 3 جۆرێ رووەکی گوڵزەرد، شێوەی Michaelmas daisy دەدا [Aster linosyris] ◌ 1 آدم موطلایی 2 آلالەی جنگلی 3 نوعی گیاه
**gold leaf** /,gəʊld 'li:f/ *noun*, also gold foil
جفجفە، زێڕپەڕ، پەرزێڕ، گەڵای زێڕین، زێڕوەرەق ◌ زرورق
**gold medal** *noun*
نیشان یان میدالی زێڕ ◌ مدال طلا
**gold medallist** *noun*
(پێشبڕکێ) هەڵگری نیشان یان میدالی زێڕ، میدالهەڵگری زێڕ ◌ برندەی مدال طلا
**gold mine** *noun*
1 کانەزێڕ 2 (خوازە) گەنج، خەزێنە 3 کاروکاسبی پڕداهات، کاری پڕقازانج یان پڕخێر ◌ 1 معدن طلا 2 (مجازی) گنجینە 3 کاسبی پرمنفعت
**gold miner** *noun*
کرێکاری کانەزێڕ ◌ کارگر معدن طلا
**gold of pleasure** *noun*
جۆرێ گیای مەدیتەرانەیی گوڵزەرد لە تیرەی کەلەم، ریشاڵی زەرد دێتێ و بەرەکەی رۆنی هەیە [Camelina sativa] ◌ نوعی گیاه
**gold plate** *noun*
1 قاپوکەوچکی لە زێڕ، هێرباری زێڕین 2 زێڕپۆش، ئاوی زێڕ، زێڕاو ◌ 1 ظروف طلا 2 آب طلا
**gold-plated** *adjective*
زێڕپۆشکراو، زێرکفت ◌ آب طلادادەشدە
**gold reserve** *noun*
پاشمەندە یان پاشکەوتی زێڕ (ئەو برە زێڕەی کە بانکی ناوەندی هەڵیدەگرێ) ◌ ذخیرەی طلا
**gold-rimmed** *adjective*
لێوارزێڕین ◌ لبطلایی
**gold-rush** *noun*
هوروژم یان پەلاماری کتوپڕی خەڵک بۆ ناوچەی زێڕەلانی، هەڵکوتانەسەر ناوچەی زێڕلێهەڵکەوتوو ◌ هجوم ناگهانی مردم بە ناحیەی زرخیز
**goldsmith** /'gəʊldsmɪθ, US 'goʊld-/ *noun*
زێڕینگەر، زێڕگەر، زێڕەنگەر، زێڕنگەر ◌ زرگر
**gold standard** *noun*
سیستەمی پارەی بنچینەزێڕ (سیستەمێکی ئابووری کە لەودا نرخی پارە لەسەر بنچینەی بەهای زێڕ رۆدەنرێ) ◌ پایەی طلا
**gold-washer** /'gəʊldwɒʃə(r)/ *noun*
خاکشۆر، زێڕەشۆر ◌ خاکشوپایەی طلا
**golem** /'gəʊləm, US 'goɪl-/ *noun*
1 (لە ئەفسانەی جوودا) مرۆڤێکی دەسکرد یان

گاقالۆنچـە، جـۆرێ قالۆنچـەی زۆر زلـەی گەرمێنان، نێرەکەی شاخێکی لقاوی لە سەری دایـە [Goliathus giganteus] (ئـەفریکـا، گـەورەتـرین قالۆنچـەی ناسـراو) و جـۆرە پێوەندیدارەکان] ◌ نوعی سوسک

**goliath frog** *noun*

گـابۆق، جـۆرێ بـۆقی زۆر زلـەی ڕۆژاوای ئەفریکای ناوەندی [Rana goliath] ◌ نـوعی قورباغه

**golliwog** /'gɒliwɒg, US 'gɑ:liwɑ:g/ *noun*

بووکە(لە)ڕەشە ◌ عروسک سیاه

**gollop** /'gɒləp/ *noun*

(نافەرمی و بریتانیا) ماشینەوە، هەڵپە(هەڵپ)، لرف(وهۆر) ◌ گولوپ

**golly**[1] /'gɒli, US 'gɑ:li/ *interjection*

بەح، تیاح، تەح: *-ly, you're early!* ◌ ای وای

**golly**[2] /'gɒli. US 'gɑ:li/ *pl.* gollies= golliwog

**golosh(e)** = galosh

**gomeral** *noun*, also gomeril

مرۆی ساویلکە ◌ آدم سادەلوح

**Gomorrah** *noun*

1 گۆمۆرا: شارێکی کۆن کە لە لایەن خوداوە لەبەر خراپی وێران و کاول کرا، لە Genesis 19 دا 2 مەکۆ یان ناوەندی خراپی ◌ گومورا

**gomphosis** /'gɒm'fəʊsɪs/ *noun*

جومگەی گەڕۆک ◌ مفصل متحرک

**gon(o)-** *prefix*

پێشگر: زاوزێیی، زاوزێ، ڕەگەزی، ئەندامی زاوزێ، تۆواوی، تۆماوی، تۆماو، تۆو، تـوو: *gonophore gonocyte* ◌ پیشوند: زایشی، زادوولد، وابسته به منی، منی، تخم

**-gon** *suffix*

پاشگر: لا(یی)، خشتەک(ی)، پاڵوو، گۆشە: *decagon hexagon* (بنـەڕەت: لـە *-gōnos* یونانییەوە "-angled") ◌ پسوند: -ضلعی

**gonad** /'gəʊnæd, US 'goʊ-/ *noun*

زاوزێڕژێن، لووی زاوزێ، ڕژێنەی ئەندامانی زاوزێ (باتوو و هێلکەدان؛ بنەڕەت: لە *gonades* لاتینی نوێ، کـۆی *gonas* لـە *gonē* یونانی "generation, seed") ◌ غدەی جنسی

**gonadal** /gə(ʊ)'neɪd(ə)l/ *adjective*

سـەربە زاوزێڕژێن، سـەربە یـان پێـوەنـدی بـە ڕژێنەی ئەندامانی زاوزێوە هەیە ◌ وابسته به غدەی جنسی

**gonadotrophic** *adjective*, also gonadotropic

هانـدەری زاوزێڕژێـن، هانـدەری بـاتوو و هێلکەدانەکان ◌ محرک غدەی جنسی

**gonadotrophin** /ˌgəʊnədə(ʊ)'trəʊfɪn/ *noun*, also gonadotropin /-'trəʊpɪn, US -'trɒpɪn/

کۆتەڵە قوڕینە لە فۆلکلۆری عیبریدا 2 ڕۆبات، مـرۆی دەزگـایی، blockhead ;automaton (بنەڕەت: لە *gōlem* عیبری "تۆپەڵێکی بێشێوە "shapeless mass") ◌ آدموارە

**golf** /gɒlf, US gɑ:lf, gɔ:lf/ *noun*

1 (یاری) گۆلف: *He enjoyed a round of -f on a Sunday morning* 2 وشـەکـۆدی دەرخەری پیتی G، هی پێوەندی رادیۆیی‌یەکان ◌ گلف

**golfball** *noun*

تـۆپ یـا گـۆی گۆلـف، تۆپـە یـا گـۆی دەزگـای نووسین ◌ توپ گلف، گلفبال

**golf club** /gɒlf klʌb/ *noun*

یانـەی گۆلـف، داری گۆلـف ◌ باشـگاه گلـف، چوب گلف

**golf-course** *noun*

یاریگای گۆلف، گۆلفگە ◌ زمین گلف

**golfer** /'gɒlfə(r), US 'gɑ:l-, 'gɔ:l-/ *noun*

گۆلفەوان، گۆلفزان، یاریزانی گۆلف ◌ گلف‌باز

**golfing** /'gɒlfɪŋ, US 'gɑ:lf-, 'gɔ:lf-/ *noun*

گۆلـفەوانی، یـاری گۆلـف، گۆلـفێن، گۆلـف ◌ بازی گلف

**golf-links** *noun*, also links, *pl.* same

یاریگای گۆلف، گۆلفگە ◌ زمین گلف

**Golgi** *adjective*

گـۆلـژی، سـەربـە دەزگـای گـۆلـژی Golgi apparatus یـا تـەنی گـۆلـژی Golgi body، پێوەندی بە دەزگای گۆلژی‌یەوە هەیە: *Golgi vesicles* ◌ گلژی

**Golgi body** /'gɒldʒi, -gi/ *noun*, also Golgi apparatus

(زیندەناسی) تەن یان دەزگای گۆلژی: کۆمەڵێ تـوورەکـە (کیسـە) یـان پـەردەی لوولـۆی نێـو سایتۆپلازمی خانەیی، لە گۆڕین و ڕاگوێستنی پرۆتینەکاندا چالاکە، هەروەها dictyosome (بنەڕەت: لە ناوی زانای ئیتالیایی Camillo Golgi) ◌ جسم یا دستگاه گلژی

**goliard** *noun*

گۆلیـارد: خوێنـدکارێکی هـەڵـوەدا و ئـاوارەی سـەدەکانی 12 و 13 کـە هـۆنراوەی بڕگـەیی و ڕەخنەگرانەی لاتینی دەهۆنییەوە ◌ گولیارد

**goliardic** *adjective*

سـەربـە یـان پێـوەنـدی بـە گۆلیـاردەوە هـەیـە ◌ وابسته به گولیارد

**Goliath** /gə'laɪəθ/ *noun*, Hebrew *Golyath*

1 جالووت، گۆلیات: پاڵەوانێکی فەلەستینی کـە بـە دەسـتی داوود (بـە قۆچـەقـانی، لـە کتـێبی پیرۆزدا) دەکوژرێ 2 دێو: *a Goliath of the computer industry* ◇ *a Goliath of a man* ◌ 1 جالوت 2 غول

**goliath beetle** *noun*

(زینـدەکیمیا) مـادەی هانـدەری زاوزێ‌رژێـن، هۆرمـــۆنی gonadotropic، گۆنـــادۆتروپین، گۆنـادۆترۆفین (وەک follicle-stimulating hormone) ◌ مادەی محرک غدەی جنسی

**gonadotropin-releasing hormone** *noun*, also luteinizing hormone-releasing hormone, *abbreviation* GnRH

هۆرمۆنـــێ کـــە لـــە لایـــەن هیپۆتالاموســـەوە hypothalamus دەردەدرێ و هـــــانی پلـــــی پێـشـووی anterior lobe ژێرمێـشـکەرژێـن pituitary gland دەدا تـا گۆنادۆتروپینـەکـان gonadotropin بداتە دەرەوە (وەک luteinizing hormone و follicle-stimulating hormone) ◌ نوعی هورمون

**gonagra** *noun*

باداری چۆک یان ئەژنۆ ◌ نقرس زانو

**gonalgia** *noun*

چۆکێشە، چۆک‌ئێشە، زانەئەژنۆ ◌ زانودرد

**Gond** /gɒnd, US gəʊnd/ *noun*, also Gondi /'gɒndi/, *pl.* same

1 ئەنـدامی گـەلێکی رەسـەن، کـە لـە دارسـتانە تەپی‌یەکانی ناوەندی هیندوستان دەژین 2 زمانی درافیدی ئەو گەلە (Gundi) ◌ گوند

**gondola** /'gɒndələ, US 'gɑːn-, gɑːn'doʊlə/ *noun*

1 گاندۆلا (جۆرێ بەلەمی بن‌تەخت بە لووتکەی بـەرزەوە و لـە کانالـی ڤـێنیز بـەکاردێتری) 2 زوورۆچکەیێ کە لەژێر کەشتی ئاسمانی یان بالۆنێکەوە هەلواسراوە ◌ گوندولا

**gondolier** /,gɒndə'lɪə(r), US ,gɑːndə'lɪr/ *noun*

گاندۆلیەر، گاندۆلاوان، گاندۆلاژۆ ◌ گاندولیر

**Gondwana** /gɒn'dwɑːnə, US gɑːn-/ *noun*, also Gondwanaland /gɒn'dwɑːnəlænd, US gɑːn-/

(زەوی‌ناســی) گـۆنـدوانـا (= ناوچەیـەکی زۆر بەربلاوی زەوی کە بە میلیۆنان سـاڵ لەوەپێش لە نیوەگـۆی باشـووری‌دا بـوو. ولاتـانی ئێـستای عـەرەبی، ئـەمریکای باشـووری، جەمـسەری باشـووری، ئەوسـترالیا و هێنـد دادەگـرێ، Laurasia ،Pangaea) ◌ گوندوانا

**gone**[1] /gɒn, US gɔːn, gɑːn/ *adjective*, *preposition*

1 بزربـوو، نادیـار، چـوو، رۆیـشتوو، نـەماو، لەدەس‌چوو، مردوو 2 رابردوو، رابووری: *It's gone six already* 3 سـکپڕ، دووگیـان 4 سەوداسەر، شێت، کوشتەومردە 5 درەنگ‌ترلە، پاش، دواتر، رابردوو ◌ 1 گم‌شده، رفته 2 گذشته 3 باردار 4 دلباخته 5 بعد از

**gone**[2] /gɒn, US gɔːn, gɑːn/ = past participle of go

**goner** /'gɒnə(r), US 'gɔːn-, 'gɑːn-/ *noun*

(نافەرمی) لەنێوچوو، رەوتـەنی، لـەدەس‌چـوو ◌ رفتنی

**gonfalon** /'gɒnf(ə)lən/ *noun*

ئالایێ کـە باریکـە یـا ئـالای چکۆلانـەی کـەی پیاهەلواسراوە ◌ گونفالون

**gonfalonier** /,gɒnfələ'nɪə/ *noun*

ئالاهەلگر، ئالابەر ◌ پرچم‌دار، گونفالونیر

**gong** /gɒŋ, US gɔːŋ, gɑːŋ/ *noun*

1 زەنگ، گانگ (ئامێر): *to bang/beat/sound* 2 *the breakfast/dinner gong* ◊ *a gong* (بریتانیا و نافەرمی) نیشـان، میـداڵ ◌ 1 زنـگ، گنگ 2 مدال

**gongoozler** /gɒŋ'guːzlə/ *noun*

سەیرکەر یان تەماشاچی بێکار ◌ تماشاگر بیکار

**Gongorism** *noun*

گۆنگـۆریزم، گۆنگۆریـسمۆ (ســپانیایی): جـۆرێ شـێوازی ئاڵـۆزی وێـژەیـی ســەربـە Luis de Góngora (1561-1627) ◌ گونگوریسم

**Gongoristic** *adjective*

گۆنگۆریـستی، سەربە گۆنگۆریزن ◌ گونگوریستی

**gonna** /'gənə, US 'gɒnə, 'gɔːnə/ = going to

**goni(o)-** *prefix*

پێـشگر: گۆشـە (بنـەرەت: لـە *gōnia* یۆنـانی "angle") ◌ پیشوند: زاویە

**gonidial** *adjective*, also gonidic

سەربە یان پێوەندی بـە گۆنیدیۆمەوە هـەیـە ◌ وابسـتە بە گونیدیوم

**gonidium** *noun*, *pl.* gonidia

خانـەیـێ یـان کۆمـەڵـێ خانـەیێکـی زاوزێـی نـارەگـەزی asexual reproductive ب.ت. لـە قەوزەکان‌دا (وەک volvox) ◌ گونیدیوم

**goniatite** /'gəʊnɪətʌɪt/ *noun*

(کۆن‌ناسی) گۆشە(ک): بوویەردی ammonoid ی جۆری سەرەتا کە کۆمەڵێ هێڵی گۆشەئاسای سادەی هەیە (بنەرەت: لە *Goniatites* لاتین، لە *gōnia* یونانی‌یەوە "گۆشە") ◌ گونیات

**gonif** /'gɒnɪf/ *noun*, also goniff

کـەسێکی نادروسـت و بێ‌ئابـروو (بنـەرەت: لـە *gannāḇ* عیبری "دز") ◌ ادم دغل

**goniometer** /,gəʊnɪ'ɒmɪtə/ *noun*

گۆشەپێو (بنەرەت: لە *goniomètre* فەرەنسی، لە *gōnia* یۆنـانی "گۆشـە" + *-mètre* "(نـامێری) پێوان") ◌ زاویەسنج

**goniometrical** /,gəʊnɪə'metrɪkl/ *adjective*, also goniometric

گۆشەپێوی‌یانە، سەربە گۆشـەپێوی ◌ وابسته بـە زاویەسنجی

**goniometry** /,gəʊnɪ'ɒmətrɪ/ *noun*

گۆشـەپێوی ◌ زاویەسنجی

**-gonium** *suffix*

پاشگر: 1 خانەی زاوزێی: *spermatogonium* 2 پێکهاتەی زاوزێی ڕووەکی *archegonium* یان fungus ێ: *oogonium* (لە لاتینی نوێ، لە gonos یۆنانی) ۞ پسوند: 1 سلول زایشی 2 ساختار تناسلی گیاه یا قارچ

**gonococcual** *adjective*

سەربە بەکتریا یان میکرۆبی سووزەنەک، پێوەندی بە بەکتریا یان میکرۆبی سووزەنەکەوە هەیە ۞ وابسته به باکتری یا میکروب سوزاک

**gonococcus** /ˌgɒnəˈkɒkəs/ *noun, pl.* gonococci /-k(s)ʌɪ, -k(s)iː/

بەکتریا یان میکرۆبی سووزەنەک [ *Neisseria gonorrhoeae*] ۞ باکتری یا میکروب سوزاک

**gonocyte** *noun,* also gametocyte

خانەی ڕەگەزی ۞ سلول جنسی

**gonophore** *noun*

(گیانەوەرناسی و ڕووەکناسی) گۆنۆفۆر: 1 لاسکێکی کورت کە نێرەک و نێرکەی ڕووەک ڕادەگرێ 2 جۆرێ خانەی پێکهێنەری ڕەگەزی دەستەیێکی گیانەوەرناساکان zooid کە جاری وایە وەک تووڕەکە یان کیسەی لێدێ (gonophoric *adj*: سەربە گۆنۆفۆر) ۞ گونوفور

**gonopore** *noun*

کونی زاوزێ، گۆنۆپۆر (لەوێوە هێلکە یان تۆماو دێتەدەرێ، ب.ت. لە بێبڕبڕەکاندا، ب.ت. هێندێ مێروو) ۞ گونوپور، سوراخ تناسلی

**gonorrhoea** /ˌgɒnəˈrɪə, US ˌgɑːnəˈriːə/ *noun,* US ginorrhea

سووزەنەک، تۆمەڕژێ، ئاوەڕژێ (بنەڕەت: لە *gonorrhoia* یۆنانی: *gonos* "تۆماو" و *rhoia* "ڕژان") ۞ سوزاک

**gonorrheal** /ˌgɒnəˈrɪəl, US ˌgɑːnəˈriːə/ *adjective*

سووزەنەکی، سەربە یان پێوەندی بە سووزەنەکەوە هەیە ۞ وابسته به سوزاک

**-gony** *suffix*

پاشگر: دروستبوون، سازبوون، پەیدابوون، پێکهاتن، پەرەسەندن، گووران؛ زاوزێ: *cosmogony*، *merogony*، *isogony* (بنەڕەت: لە *-gonia* لاتین، لە *gonos* یۆنانییەوە) ۞ پسوند: تکون؛ تناسل، توالد

**gonzo** /ˈgɒnzəʊ, US ˈgɑːnzoʊ/ *adjective*

1 سەربە ڕۆژنامەوانیی گونزۆ: *gonzo journalism* 2 سەیر یان شێت ۞ 1 وابسته به روزنامەنگاری گونزو 2 عجیب یا دیوانه

**gonzo journalism** /ˈgɒnzəʊ dʒɜːnəlɪzəm, US ˈgɑːnzoʊ dʒɜːrn-/ *noun*

ڕۆژنامەوانی یان ڕۆژنامەگەریی گونزۆ ۞ روزنامەنگاری گونزو

**gonzo journalist** *noun*

ڕۆژنامەوانی گونزۆ، ڕۆژنامەگەری گونزۆ ۞ روزنامەنگار گونزو

**goo** /guː/ *noun*

1 لیچق، لینج، چەسپ، چەسپاوی، پێسی، مادە یان ماکی لینج 2 سۆزگیری، سۆزگرتن، سینتیمێنتالیزم (gooeyness *n*) ۞ 1 چسبناک، مادەی چسبناک 2 احساساتی گری

**good** /gʊd/ *adjective, noun*

1 *adj* باش، چاک، قەنج، خاس 2 چەلەنگ، خۆش، وەش، شیرین 3 دڵسۆز، دەسگر، بەدەمخەڵکەوەبوو 4 گونجاو، لەبار، شیاو 5 بەسوود، بەقازانج، بەکەڵک 6 بەڕەوشت، ڕەفتارباش 7 ساغ، سەلامەت، ساخلەم 8 جێیمتمانە، جێیباوەڕ، بەنرخ، بەبایەخ، باوەڕپێکراو، لێڕابینراو 9 باش، دروست، ڕاست 10 شارەزا، کارامە، سەردەرچوو، بەتوانا، کارزان 11 زۆر، کەمێ زۆر 12 (جلوبەرگ) تازە، خاوێن، نەو 13 ناقەڵب، ئەسڵ، ڕەسەن، ڕاستەقینە، تەواو، ڕەبەق 14 شیرپاک، پاک، گەورەپیاو 15 بەجێ، ژیرانە *n* 1 چاکە، باشە، کاری چاکە، خێر 2 کردەوەی باشە 3 باشی، چاکی 4 قازانج، سوود، بەرژەوەندی 5 خەڵکی باش، چاکەکاران، خێرخوازان 6 شتی چاک ۞ *adj* 1 خوب 2 خوشایند 3 مهربان 4 مناسب 5 مفید 6 مؤدب 7 سالم 8 معتبر، ارزنده، مطمئن 9 صحیح 10 ماهر 11 بسیار 12 (لباس) نو 13 غیرتقلبی 14 شریف 15 موجه *n* 1 نیکی 2 امر خیر 3 حسن 4 مصلحت 5 مردم نیک 6 چیز خوب

**good afternoon** *noun, interjection*

ئێوارە باش، ئێوارێیەکی خۆش، دوانیوەڕۆباش ۞ عصر بخیر

**Good Book** *noun*

کتێبی پیرۆز ۞ کتاب مقدس

**goodbye** /ˌgʊdˈbaɪ/ *noun, interjection,* US also goodby

*n* ماڵاوایی، خوداحافیزی، خاترخوازی *interj* خوا ئاگادارت بێ، خوات لەگەڵ، بە خێر چن، بە خودام سپاردن، خوا ئاگادارتان بێ ۞ *n* خداحافظی *interj* خدا نگهدار!

**good day** *noun*

ڕۆژباش، ڕۆژێکی خۆش ۞ روز بخیر

**good evening** *noun, interjection*

شەوباش، شەوێکی خۆش ۞ شب بخیر

**good faith** *noun*

نیازباشی ۞ حسن نیت

**goodfella** *noun*

(ئەمریکا و نافەرمی) گانگستێر، تاوانکار ب.ت. ئەندامی مافیا ۞ گانگستر

**good-for-nothing** /ˈgʊd fɔ ˈnʌθɪŋ/ *adjective, noun*

1 لێنەهاتوو 2 بێبایەخ، خوێڕی، بێنرخ 3

بێکاروبێــار، لــەش گــران، تەمــەڵ، تــەپلۆس، تەوەزەل ◌ 1 نالایق 2 بی‌ارزش 3 تەلش، تنبل

**Good Friday** *noun*
هــەینی پــیرۆز (هــەینی پــێش جەژنــە فــتیرە، یادکردنــەوەی لــەخاچ‌دانی پێغەمبــەر عیــسا) ◌ جمعەی مقدس

**good-hearted** *adjective*
دڵباش، دڵــسۆز، دڵوفان، دڵنەرم ◌ مهربان

**good-heartedly** *adverb*
دڵــسۆزانە ◌ با مهربانی

**good-heartedness** *noun*
دڵباشــی، دڵــسۆزی، دڵوڤــانی، دڵــنەرمی ◌ مهربانی، خوش‌قلبی

**good humour** *noun*
رووخۆشی، شادی، خووباشی ◌ خوش‌خلقی

**good-humoured** /ˌgʊd ˈhjuːməd/ *adjective*
رووخۆش، شاد، خووباش: *a good-humoured atmosphere* ◌ خوش‌خلق

**good-humouredly** *adverb*
رووخۆشانە، بە رووخۆشی(یەوە) ◌ باخوش‌خلقی

**goodie** = goody

**goodies** *noun, pl.*
1 شــتە خۆشــەکان، شــیرینی‌جــات، شــیرینیات، شیرینی 2 شتە باشــەکان ◌ 1 تنقلات 2 چیزهای خوب

**goodish** /ˈgʊdɪʃ/ *adjective*
1 ئەندازە، تا ئەندازەیێ باش، کەمێ چــاک: *'Is the salary good?' 'Goodish.'* 2 کــەمێ گەورە: *It'll be a goodish while yet before I've finished* ◌ 1 نسبتاً خوب 2 نسبتاً بزرگ

**Good King Henry** *noun*
جۆرێ گیای خۆراکی بە گەڵای زلی سەوزی تونــــدەوە و هێـــــشووە گوڵـــــی بەنرخـــــەوە [*Chenopodium bonus-henricus*] ◌ نــوعی گیاه

**good looker** *noun*
(ناڤەرمی) جوان و لەبار ◌ لعبت

**good-looking** /ˈgʊd ˈlʊkɪŋ/ *adjective*
ســەرنج‌راکــێش، جــوان‌چــاک، شــۆخ، جــوان، چەلەنگ: *a good-looking man* ◌ جذاب

**good looks** *noun, pl.*
دەم‌وچــاوی جــوان، روخـــاری ســەرنج‌راکــێش، جــوانی، چەلەنگی: *an actor famous for his rugged good looks* ◌ صورت زیبا

**goodly** /ˈgʊdli/ *adjective* (goodlier, goodliest)
1 زۆر، زەبەند 2 جوان، سەرنج‌راکێش، دڵرفێن، شۆخ‌وشەنگ ◌ 1 زیاد 2 زیبا، جذاب

**goodman** /ˈgʊdmən/ *noun, pl.* goodmen
(کۆن و زۆرتر لە سکاتلەند) گەورەی ماڵێ ◌ رئیس خانواده

**good morning** *noun, interjection*
بەیانی باش، بەیانی‌یەکی خۆش ◌ صبح بخیر

**good nature** *noun*
دڵــــسۆزی، دڵــــنەرمی، دڵباشــــی، دڵوڤــــانی، رووخۆشی، خووباشی خۆش‌خویی ◌ مهربــانی، خوش‌قلبی

**good-natured** /ˈgʊd neɪtʃəd/ *adjective*
دڵــسۆز، دڵــنەرم، دڵــباش، دڵوڤــان، رووخــۆش، خووبــاش، خــۆش‌خــوو: *a good-natured person/discussion* ◌ مهربان، خوش‌قلب

**good-naturedly** *adverb*
دڵسۆزانە: *to smile -d-naturedly* ◌ با مهربانی

**good-neighbour** *adjective*
(لەســەر بنچینــەی) پێوەنــدی بــاش، پێوەنــدی دۆستانە: *a good-neighbor policy* ◌ (مبتنــی بر) حســن هم‌جواری

**good-neighbourliness** *noun*
پێوەندی باش، پێوەندی دۆستانە، دراوسێ‌باشی، نێوان‌خۆشی ◌ حســن هم‌جواری

**goodness** /ˈgʊdnəs/ *noun, interjection*
1 چــاکی، چــاکێتی، باشــە، چاکــە، خاســێ 2 دڵسۆزی، دڵوڤانی، دڵباشی، خێر، چاکەکاری، خێرخوازی 3 تەح، پیاح، پەح، خوایە گیــان ◌ 1 خوبی، نیکی 2 مهربانی، احسان 3 ای وای

**goodnight** /ˌgʊdˈnaɪt/ *noun*
شەوباش، شەوێکی خۆش ◌ شب بخیر

**good offices** *noun*
نێوگژیــــوانی، نــــاوبژیکــــەری، ناڤــــبەری، ناونجی‌گەری ◌ میانجی‌گری

**goods** /gʊdz/ *noun, pl.*
کەل‌وپەل، شمەک، واڵە، شت‌ومەک، بارخانە ◌ اجناس، مال‌التجاره

**good Samaritan** *noun*
مرۆی بەهاناوەهاتوو، مرۆی دەسگر، بنیادەمی دڵسۆز، مرۆدۆست، بڕوانە Samaritan 1 ◌ آدم نوع‌دوست

**goods and chattels** *noun, pl.*
کەل‌وپەلی خۆ، بارگەوبنە ◌ لوازم شخصی

**good sense** *noun*
ئەقڵی بەکردەوە، باش‌دادگەری، باش‌بڕیاردان، توانایی دەکردنی بڕیارێکی دروست ◌ شعور، قوەی تمیز

**goods train** *noun*
شەمەندەفەری بارهەڵگر یان باری ◌ قطار باری

**goods wagon** *noun*
عەرەبانە یــان واگــۆنی بارهەڵــگر یــان بــاری ◌ واگن باری

**good-tempered** /ˌgʊd ˈtempəd/ *adjective*
1 رووخــۆش، خوونــەرم، خووخــۆش، بەخوڵــق، دڵــباش 2 مەنــد، لەســەرەخۆ ◌ 1 خــوش‌خلــق،

خوش‌قلب 2 ملایم

**good-temperedly** *adverb*
ڕووخۆشانه، به‌ خوونه‌رمی‌یه‌وه ۞ با خوش‌خلقی

**good-time** *adjective*
خۆش‌گوزه‌ران، خۆش‌ڕابوێر ۞ خوش‌گذران

**good-timer** *noun*
مرۆی خۆش‌گوزه‌ران، مرۆی خۆش‌ڕابوێر ۞ آدم خوش‌گذران

**good-timer girl** *noun*
کچی خۆش‌گوزه‌ران یان خۆش‌ڕابوێر ۞ دختر خوش‌گذران

**goodwill** /ˌgʊdˈwɪl/ *noun*
1 نیازباشی، نیازپاکی، ویستی باش: *a spirit of* 2 *goodwill in international relations* (دووکان و هتد) سه‌رقفلی ۞ 1 حسن نیت، اراده‌ی نیک 2 سرقفلی

**good word** *noun*
قسه‌ی خۆش، قسه یان وته‌ی باش ۞ حرف خوشایند

**good works** *noun, pl.*
کاروباری باش یان خێرخوازانه ۞ اعمال نیک یا خیرخواهانه

**goody** /ˈgʊdi/ *noun* (*pl.* goodies), *interjection*
*n* 1 (فیلم، چیرۆک و هتد) قاره‌مان، پیاوی باش، که‌سایه‌تی باش 2 شتی خۆش: *a basket of goodies for the children* *interj* به‌هه‌ به‌هه‌ ئای گیان ۞ *n* 1 شخصیت مثبت 2 چیز خوشمزه *interj* آخ جون

**goody-goody** *noun, adjective*
مرۆی ریایی‌باز، مرۆی دووڕوو، خۆده‌رخه‌ر، خۆنوێنه‌ر، خۆنیشانده‌ر ۞ آدم ریاکار، متظاهر

**gooey** /ˈguːi/ *adjective* (gooier, gooiest)
1 لینج، لیچق، چه‌سپاوی: ◊ *a gooey mess* 2 به‌سۆز، هه‌ستبزوێن، سێنتیمێنتال، سۆزاوی: *gooey cakes* ۞ 1 چسناک 2 احساساتی

**goof** /guːf/ *noun*
1 هه‌ڵه‌ی گه‌وجانه، لێ‌هه‌ڵقلیشان 2 مرۆی گه‌وج‌وله‌وج ۞ 1 اشتباه احمقانه 2 آدم احمق

**goofball** /ˈguːfbɔːl/ *noun*
مرۆی گه‌وج ۞ آدم احمق

**goofus** /ˈguːfəs/ *noun*
کرۆی که‌روگه‌وج ۞ آدم احمق

**goofy** /ˈguːfi/ *adjective* (goofier, goofiest)
که‌روگه‌وج، نه‌فام، شێت: *a goofy grin* ۞ احمقانه، دیوانه

**goog** *noun*
هێلکه، خا، هێک ۞ تخم مرغ

**Google** /ˈguːgl/ *noun*
گوگل (مۆتۆری گه‌ڕان له‌سه‌ر ئینتێرنێت) ۞ گوگل

**googly** /ˈguːgli/ *noun, pl.* googlies
1 (کریکێت) گوگلی 2 (بریتانیا و نافه‌رمی) وه‌ته، باتوو، گون ۞ 1 گوگلی 2 بیضه

**googol** /ˈguːgɒl/ *noun*
ژماره‌ی $10^{100}$ ۞ عدد $10^{100}$

**googolplex** /ˈguːg(ə)lplɛks/ *noun*
ژماره‌ی یه‌ک له‌گه‌ڵ ئه‌و ژماره‌ی سیفرانه‌ی به‌ توانی ده به‌ توانی ده به‌ توانی سه‌د ۞ گوگول‌پلکس

**gook** /guːk, US gʊk/*noun*
بێگانه، بیانی، ده‌ره‌کی (ب.ت. که‌سێ له‌ ره‌چه‌ڵه‌کی باشووری رۆژهه‌ڵاتی ئاسیا) ۞ اجنبی، خارجی، بیگانه

**goolie** /ˈguːli/ = gooly

**goombay** /ˈguːmbeɪ/ *noun*
1 ته‌پلی تیمانجی (به‌ ده‌س لێده‌دری) 2 (زۆرتر له‌ باهاماس) فێستیڤالی موسیقا و هه‌ڵپه‌ڕکێ، شایی‌ولۆغان ۞ گومبای

**goon** /guːn/ *noun*
1 (نافه‌رمی) مرۆی گه‌وج و بێ‌مێشک 2 (له‌ ئه‌مریکا) که‌ڵه‌گا، چه‌قۆکێش (به‌کرێگیراو بۆ ترساندنی خه‌ڵک) 3 (بریتانیا) پاسه‌وانی که‌مپی گیراوانی شه‌ڕی ئه‌ڵمانی به‌درێژایی شه‌ڕی جیهانی دووه‌م ۞ 1 آدم احمق و کودن 2 چاقوکش 3 گون

**goonda** /ˈguːndə/ *noun*
(له‌ هیند) که‌ڵه‌گا، چه‌قۆکێشی به‌کرێگیراو (له‌ هیندی *gundā* "rascal") ۞ چاقوکش

**gooney bird** *noun*, also black-footed albatross or gooney
(ئه‌مریکا و نافه‌رمی) گێژه (له‌ simpleton ئینگلیسی‌یه‌وه)، ئالباتروس (ی پێ‌ڕه‌ش) albatross، هی پاسیفیک، زۆرتر به‌ ده‌نووکی تۆخ یان مه‌یله‌وقاوه‌یی و لاقی ره‌شه‌وه [*Diomedea nigripes*] ۞ آلباتروس

**goop** *noun*
(نافه‌رمی) مرۆی گه‌وج ۞ آدم احمق

**goosander** /guːˈsandə/ *noun, pl.* same or goosanders
(گیانه‌وه‌رناسی) مراوی ماسیگره، مراوی ماسیخۆره، قازه‌لووره‌یه‌کی زله (مراوی خۆلوورکه‌ر)، نێره‌که‌ی به‌ سه‌ری سه‌وزی توند و بنه‌وه‌ی مه‌یله‌وسپی‌یه [*Mergus merganser*] ۞ گوساندر

**goose** /guːs/ *noun, pl.* geese /giːs/
1 قاز [چه‌ندین توخم له‌ خێزانی Anatidae] 2 گۆشتی قاز 3 قازی مێ 4 (نافه‌رمی، ب.ت. ژن) مرۆی گه‌وج و خۆش‌باوه‌ڕ 5 ئوتو (ئه‌ڵمانی بنه‌ڕه‌ت) ۞ 1 غاز 2 گوشت غاز 3 غاز ماده 4 آدم احمق و زودباور 5 اطو

**goose barnacle** *noun*

ڕەهۆڵلێدەری ئەمریکایی، بە توورەکەی چەنەوە [خێزانی Geomyidae: گـەڵـێ جـۆرن] 2 (نافەرمی) وشەیێکی ئەمریکای باکووری بۆ ground squirrel 3 کرێکاری کانکەن (کانی بەرد) 4 (کامپیوتێر) ڕێکخستەیێکی ئینتێرنێتی کە بۆ بەڵگەنامەکان لەمەڕ بابەتێ دەگەڕێ 5 variant spelling of gofer ◌ 1 و 2 گوفر 3 کارگر حفار معادن سنگ 4 گوفر

**gopher wood** /'gəʊfə wʊd/ *noun*

دارێ کە کەشتی پێغەمبەر نووحی پێ دروست کراوە و لەوەدچێ کە کاژ بووبێ ◌ گوفروود

**gopik** /'gəʊpɪk/ *noun*

یەکـەی پـارەی ئازەربایجـان، بەرامبـەر بـە سەدیەکی manat ◌ گوپیک

**goral** /'gɔ:r(ə)l/ *noun*

بزنـەکێویـیـەکی مـوودرێژ، بـە شـاخی پشتەوەچەماو، لە ناوچەی شاخاوی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دەبینرێ [توخم *Nemorhaedus*] ◌ گورال

**gor-bellied** /'gɔ: belɪd/ *adjective*

زگزل، زگمەشکە، زگتێر ◌ شکم‌گنده

**gorcock** /'gɔ:kɒk/ *noun*

(سکاتلەند) نێری کەتی یان کوڕکوڕەسوورە ◌ گورکوک

**Gordian knot** /ˌgɔ:diən 'nɒt, US ˌgɔ:rdiən 'nɑ:t/ *noun*

1 گـرێکـوێرە، گـرێبووچکـە، کێـشەی بێچارەسەر، ئاستەنگی چارەنەکراو 2 گرێیێکی ئەفسانەیی کە لە لایەن Gordius پادشای Phrygia (یـان Gordium) لێـدرا و چـوون ئەسکەندەری مەزنیش Alexander the Great نەیتوانی بیکاتەوە بە شمشێر بڕی (لەبەر ئەو پێشبینی‌یە کە هەرکەسێ بیکاتەوە دەبێتە دەسەڵاتداری ئاسیا) ◌ 1 مـشکل لاینحـل 2 گوردین نات

**Gordon setter** *noun*

جـۆرێ تـانجی ڕەگەزڕەشـی تـووکدرێـژ ◌ گوردون ستر

**gore**[1] /gɔ:(r)/ *noun*

1 خوێن (مەییو)، جەڵغە 2 (ب.ت. لە دۆخێکی توندوتیژیدا) بکوژ و ببڕە، خوێن و خوێنڕشتن، کوشت و کوشتار (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ 1 خـون (لخته) 2 خون و خونریزی

**gore**[2] /gɔ:(r)/ *noun*

1 (داوێـن، چـەتر، باگـەڕ، دروومـان و هتـد)، تەرک، تیرێژ، چمک، گرۆڵ، تیکە یان بڕشتی سێسووچ 2 (کۆن، تیکە) زەوی سێسووچ ◌ 1 ترک، مرغک 2 زمین سه‌گوش

**gorer** *noun*

گیانەوەری شاخوەشێن، شفرەوەشێن ◌ جـانور شاخ‌زن

**Goretex** /'gɔ:teks, US 'gɔ:rt-/ *noun*, also

نووسەکە یان بارناکڵی قازی [توخم *Lepas*] ◌ نوعی بارناکل

**gooseberry** /'gʊzbəri, US 'gu:sberi/ *noun, pl.* gooseberries

1 (ڕووەکناسـی) مێوەمارانـێ، هـەنگوورەمارە، مێوەمارانـە 2 دەوەنـی هـەنگوورەمارە [ *Ribes grossularia*] 3 مـلۆزم، سـەرودڵگـر، درکـی مەموزین، سەرەخەر ◌ 1 انگور فرنگی 2 بوتـەی انگور فرنگی 3 مزاحم

**goosefish** *noun , pl.* same or goosefishes

(ئـەمریکـای بـاکووری) قـازەماسـی، جـۆرێ anglerfish ی تـەرکنـشین [ *Lophius americanus* و جۆرەکانی تر] ◌ نوعی ماهی

**gooseflesh** /gu:sfleʃ/ *noun,* also goosebumps

مووبزبوونـەوە، مـوو قرژبـوون، مـووگرژی، قژهەسـتان، پەرەمریـشکە، وردەزیپکـە، دەنکەدەنکـەبوونی پێـست (لەبـەر تـرس یـان سەرما) ◌ سیخ شدن مو، ترکیدگی پوست

**goosefoot** /gu:sfʊt/ *noun, pl.* goosefoots

(ڕووەکناسـی) پـێقـازە، قازیاخـە [تـوخم *Chenopodium*] ◌ نوعی گیاه

**goosegog** /'gʊzgɒg, US 'gu:sgɒg/ = gooseberry

**goosegrass** /gu:sgrɑ:s/ *noun*

(ڕووەکناسی) گیاقازە؟ [*Galium aparine*] ◌ نوعی گیاه

**gooseherd** /gu:shɜ:d/ *noun*

قازەوان ◌ غازچران

**gooseneck** /gu:snek/ *noun*

ئانیشکە، چەڵەمە، چەڵەمەیی U ◌ زانویی

**goose pimples** = gooseflesh

**gooseskin** /gu:s skɪn/ = gooseflesh

**goose-step** /gu:s step/ *noun*

هـەنگاونانی بـێ چـۆکنوشتانەوە، قـازەڕەوی، ڕێڕەوی ئەڵمانی ◌ راه رفتن بـدون گـام‌هـای شکسته

**goosey** /gu:sɪ/ *adjective* (goosier, goosiest), also goosy

1 (نافەرمی) سادە، ساویلکە 2 قازئاسا، شێوەقاز ◌ 1 ساده‌لوح 2 غازمانند

**GOP** /ˌdʒi: əʊ 'pi:, ɒʊ/ *abbreviation* Grand Old Party

(لـە ئـەمریکا) پـارتی کۆمـاریخـواز ◌ حـزب جمهوری‌خواه

**gopak** /'gəʊpak/ *noun,* also hopak

جـۆرێ هەڵـپەڕکێی نـەریتی کـرژی ئـۆکراینی، پیاوان دەیکەن ◌ گوپاک

**gopher** /'gəʊfə(r), US 'gəʊ-/ *noun,* also ground squirrel

1 (هەروەها pocket gopher) جۆرێ کرتێنەری

Gore-tex
(دروشمی کارداری یان بازرگانی) گۆرتێکس (= مادە و کەرەسەیێکی سووک کە ئاو دانادا، بەلام هەڵم و بۆخی تێوەوەی دەردەچێ، بۆ جلوبەرگی وەرزشی و دەرەوە بەکار دێنرێ) ◇ گورتکس

**gorge** /gɔ:dʒ, US gɔ:rdʒ/ *noun*
1 تەنگەلان، دەربەند، تەنگ، گەلی، گاز، گازەدووک، شێو و دۆلی قوول (زۆرجار ئاویشی پیادەڕوا) 2 تەنگەرێ، ڕێگای تەسک، دەرتەنگ، دەربەند 3 گەروو، قورگ، ئاوەخۆرە 4 (بیناسازی) ڕێڕەوی باریکی پشتەوە (لە سەنگەربەندی) 5 شتی ناو گەدە یان مێعدە 6 بەرد یان ئێسکی تیژکراو بۆ ڕاوەماسی ◇ 1 درەی عمیق 2 راه تنگ 3 گلو، حلق 4 راهرو باریک عقبی 5 محتویات معده 6 گورگ

**gorgeous** /'gɔ:dʒəs, US 'gɔ:rdʒəs/ *adjective*
1 جوان، دلرفێن، سەرنجڕاکێش: *a gorgeous girl/man* 2 بەشکۆ، بەتەنتەنە، بەکەشخە 3 بەئالاوواڵا، ڕەنگاوڕەنگ، ڕازاوە، بەزریقەوبریقە، بریقاوی ◇ 1 زیبا، خوشگل 2 مطنطن 3 براق، پرزرق و برق

**gorgeously** /'gɔ:dʒəsli, US 'gɔ:rdʒəsli/ *adverb*
بەشکۆیانە، بە شێوەیەکی جوان یان بەشکۆ ◇ به طور مجلل

**gorgeousness** /'gɔ:dʒəsnəs, US 'gɔ:rdʒəsnəs/ *noun*
1 شکۆ، کەشخە، تەنتەنە، دەبدەبە، زاژوفەڕ 2 زریقەوبریقە، ئالاوواڵا ◇ 1 جلالت، طنطنە 2 زرق و برق

**gorger** /'gɔ:dʒə(r)/ *noun*
زۆرخۆر، تێتەپێنەر ◇ پرخور

**gorget** /'gɔ:dʒɪt/ *noun*
1 زرێی مل، ملەوانە، ملپۆش 2 سەرپۆش (مل و سنگ دادەپۆشێ) 3 تەوق، ملوێنک، هەوسارە، گوێرەوسار 4 میل یان لوولەی نەشتەرگەری ◇ 1 گلوپوش 2 مقنعه 3 طوقه 4 گورجیت

**gorgio** /'gɔ:dʒɪəʊ/ *noun, pl.* gorgios
ناوی کاولی gypsy بۆ ناکاولییێ ◇ گورجیو

**gorgon** /'gɔ:gən, US 'gɔ:rgən/ *noun*
شەیتان، پیرێژنی ناحەز، دەلەدیو، پەتیارە، سەلیتە ◇ عفریته

**Gorgon** /'gɔ:gən, US 'gɔ:rgən/ *noun*, Latin, from Greek *Gorgōn*
(میسۆلۆژی یۆنانی) گۆرگۆن، هەریەک لەو سێ خوشکە قژمارانەی کە هەرکەس چاوی لێبکردایەن دەبوو بە بەرد ◇ گورگون

**Gorgonzola** /,gɔ:gən'zəʊlə, US ,gɔ:rgən'zoʊlə/ *noun*
گۆرگۆنزۆلا (= جۆرێ پەنیری پرچەوری ئیتالیایی) ◇ گورگونزولا

**gorilla** /gə'rɪlə/ *noun, pl.* gorillas
1 گوریل: مەیموونی زۆر بەهێز و گەورەی ئەفریکایی، گەورەترین سەرەتاکی primate زیندوو [*Gorilla gorilla*] 2 پیاوی درندە و ناحەز، زرتەبۆز 3 مرۆی توندوتیژ، پیاوکوژ، خراپ؛ دزێ کە بە زەبر و ئەشکەنجە دزی دەکا (لە ناوی ڕەگەزێکی ژنانی قژن کە Hanno لە گەشتەکەیا بە درێژایی کەناری ئەفریکا لە سەدەی پێنجەمی پێشزایین باسی دەکا) ◇ 1 گوریل 2 آدم جانورخو و زشت 3 قاتل، گوریل

**Gorkhali** = Gurkhali

**gormand** /'gɔ:mənd/ *noun*
خاوەن سەررشتە لە خواردندا، خۆراکناس، خۆشخۆر، خواردە ◇ خوب چیزخور

**gormandizer** *noun*
1 زگبەردەرەوە، تێتەپێنەر، بخۆر، زگەڕۆ، چلێس 2 خۆشخۆر، خواردە ◇ 1 شکمبارە 2 خوب چیزخور

**goriness** /'gɔ:rinəs/ *noun*
خوێناویبوون، شەلالیتی، خەلتانی خوێنبوون ◇ خونآلود بودن

**gormless** /'gɔ:mləs, US 'gɔ:rm-/ *adjective*
گەوج، کەر، نەفام: *Don't just stand there looking gormless—do something!* ◊ *a gormless boy*: gormlessly *adv*) کەرانە، گەوجانە؛ gormlessness *n*: کەریتی، گەوجیتی، نەفامی، بێمێشکی) ◇ احمق، کودن

**gorp** /gɔ:p, US gɔ:rp/ *noun*
گۆرپ (تێکەڵەیێ لە کاکلە و مێوەی وشکەوەکراو و هتد) ◇ گورپ

**gorse** /gɔ:s, US gɔ:rs/ *noun*
(ڕووەکناسی) گۆرس، سێسووێ، جەگەن [*Ulex europaeus* و جۆرە پێوەندیدارەکان] ◇ اولکس فرنگی، جگن

**Gorsedd** /'gɔ:sɛð/ *noun*, Welsh, 'mound, throne, assembly'
ئەنجومەنی ویلزی و هۆنەران و Druid ـەکانی تری سێلتیک ◇ گورسد

**gory** /'gɔ:ri/ *adjective* (gorier, goriest)
شەلالی خوێن (مەیبو)، خوێناوی، خەلتانی خوێن، پڕتوندوتیژ، قەباحەت ◇ خونآلود، خونین

**gosh** /gɒʃ, US gɑ:ʃ/ *interjection*
(نافەرمی) ئاخ، خوایە، ئەی خوایە، تیاح، پەح: *Gosh, is that the time?* ◇ ای وای، عجبا

**goshawk** /'gɒshɔ:k, US 'gɑ:s-/ *noun*
باز، قازەباز [*Accipiter gentilis* و جۆرەکانی تر] ◇ باز

**gosht** /gəʊʃt/ *noun*
گۆشتی سوور ◇ گوشت قرمز

**gosling** /'gɒzlɪŋ, US 'gɑ:z-/ *noun*
پێچووە قاز، بەچکە قاز، جوچکەقاز ۞ جوجە غاز
**go-slow** *noun*, US slowdown
مانگرتنی کەمکاری، نارەزایی، پرۆتێست (بە خاوەخاو لە کارکردندا) ۞ اعتراض
**gospel** /'gɒspl, US 'gɑ:spl/ *noun*
1 باوەڕ، ڕێباز: *He preached a gospel of* 2 ئامۆژگاری 3 ڕاستی، *military strength* ڕاستەقینە: *Is that gospel?* 4 (gospel music) جۆرێ موسیقای کریستانیەت کە لەودا گۆرانی‌یە دینی‌یەکان بە دەنگی بەرز دەوترێن 5 (Gospel) ئینجیل(= یەکەمین کتێب لە چوار کتێبی پەیمانی نوێ): *the Gospel according* 6 *to St John* هەریەک لەو کتێبانە 7 هەواڵی خۆش، مزگێنی، مژدە ۞ 1 عقیدە، مرام 2 تعالیم 3 حقیقت 4 گوسپل 5 (Gospel) انجیل 6 هریک از این کتب 7 خبرِ خوش
**gospeller** *noun*
ئینجیل‌خوێن ۞ قاری انجیل
**Gospel side** *noun*, also gospel side
(لە کلیسە) لای سەرەوەی مێحراب (کە ئینجیلی لێ دەخوێنرێتەوە، بڕوانە epistle side) ۞ گوسپل ساید
**gospel truth** *noun*
ڕاستی تەواو، ڕاستی ڕەبەق، شتێکی تەواوڕاست ۞ حقیقت تردیدناپذیر
**goss** = gossip, Brit, informal
**gossamer** /'gɒsəmə(r), US 'gɑ:s-/ *noun, adjective*
*n* 1 داوی (تاڵ) جاڵجاڵۆکە، تەنافی شەیتان 2 پارچەی تەنک (ناسک) *adj* 1 ناسک، تەنک 2 سووک، سفک ۞ *n* 1 تار عنکبوت 2 پارچەی نازک *adj* 1 نازک 2 خفیف
**gossamer wings** *noun, pl.*
باڵە ناسکەکان، تەنکەباڵەکان، باڵەپەردەیی‌یەکان ۞ بال‌های نازک
**gossamery** *adjective*
ئاوەڕیس، باریک‌ڕیس، باریک، ناسک ۞ نازک
**gossip** /'gɒsɪp, US 'gɑ:sɪp/ *noun*
1 دەنگۆ، بەندوباو، واتووورە، لۆغەت، ڕەمڵ، قسە، گەپ، چەڵتە، مقۆمقۆ، وتەوت، قسەڵۆک 2 قسەی هیچەکە و پووچەکە، هەڵێت‌وپڵێت 3 خراپەوتن، گاڵەگورت، زەمکردن، لەپادوان 4 مرۆی دەم‌بەهاوار ۞ 1 شایعە، شایعات 2 دری‌وری 3 بدگویی 4 آدم شایعەپراکن
**gossip column** *noun*
ستوونی بەندوباو یان ڕووداوەکان ۞ ستون شایعات یا وقایع
**gossip columnist** *noun*
ستوون‌نووسی بەندوباوەکان یان قسەڵۆک ۞ نویسندەی ستون شایعات
**gossiper** *noun*
قاوداخەر، بەندوباوداخەر، دەم‌بەهاوار ۞ شایعەپراکن
**gossipry** /'gɒsɪprɪ/ *noun*
قسەڵۆک یان بەندوباو (پێ‌بنچینە) ۞ شایعات
**gossipy** /'gɒsɪpɪ, US 'gɑ:s-/ *adjective*
1 لەگەڵ بەندوباو، قسەڵۆک‌تێکەڵ: *a gossipy letter* 2 قاوداخەر، بەندوباوداخەر، دەم‌بەهاوار ۞ 1 شایعەآمیز 2 شایعەپراکن
**gosson** /gɒ'su:n/ *noun*
(ئیرلەندی) کوڕ، پسر (بنەڕەت: لە *garçon* فەرەنسی "کوڕ boy") ۞ پسر
**gossypol** /'gɒsɪpɒl/ *noun*
(کیمیا) گۆسیپۆل، گاسیپال: ئاوێتەیێکی بلووری ژاراوی $C_{30}H_{30}O_8$، لە ڕۆنی پەموانەدا، ڕەنگ یان پیگمێنتی فێنۆلیکی ژاراوی ۞ گوسیپول
**got** /gɒt, US gɑ:t/ = past and past participle of get
**gotcha** /'gɒtʃə, US 'gɑ:tʃə/ *abbreviation* I've got you
**goth**[1] /gɒθ, US gɑ:θ/ *noun*
شێوازێکی موسیقای گەلی هەشتاکان و لە موسیقای punkـەوە پەرەی سەندووە ۞ گوت
**Goth**[2] /gɒθ/ *noun*
ئەندامی گەلێکی ئەڵمانی کە پەلاماری ئیمپراتۆری ڕۆمیان لە نێوان سەدەکانی سێیەم تا پێنجەم دا (بنەڕەت: لە *Gutthiuda* گۆتی) ۞ گوت
**Goth**[3] = Gothic
**Gotham** /'gɒθəm, US 'gɑ:θ-/ *noun*
(نافەرمی) گۆتام، گۆسام (شاری نیۆیۆرک؛ Gothamite *n*) ۞ گوتام
**Gothic** /'gɒθɪk, US 'gɑ:θ-/ *adjective, noun*
*adj* 1 گۆتیک، سەربە گۆتەکان (ئەو ئەڵمانیانەی کە بەدژی ئیمپراتۆری ڕۆم شەڕیان کرد) 2 (gothic) سەربە شێوازی بیناسازی گۆتیک 3 سەربە گات یان گۆتەکان یان موسیقای ڕاک‌یان *n* 1 زمانی گۆتیک 2 پیتە چاپی‌یەکان یان هێڵی گۆتیک 3 شێوازی بیناسازی گۆتیک ۞ *adj* گوتیک *n* 1 زبان گوتیک 2 حروف یا خط گوتیک 3 سبک معماری گوتیک
**Gothic arch** *noun*
تاقی (نووک)تیژ یان قووچ ۞ طاق گوتیک یا مخروطی
**gothic novel** *noun*
ڕۆمانی گۆتیک (ژانرێکی ئینگلیسی چیرۆک، باو لە سەدەی 18 تا سەرەتای سەدەی 19) ۞ رمان گوتیک
**gotta** / 'gɒtə, US 'gɑ:tə/ = got to
**gotten** = past participle of get
**gouache** /gu'ɑ:ʃ, US gwɑ:ʃ/ *noun*

بەڕێوەبردن، لە بەڕێوەبردن دێ ( **governability** (**governableness** *n* ,*n*) ⟡ ادارەکردنی

**governance** /ˈgʌvənəns, US -vərn-/ *noun*
1 حکومەت، دەوڵەت، میری، فرمانگێری، دەسەڵاتگێری، حوکمڕانی، دەسەڵاتداری، فەرمانڕەوایی، حوکمداری، ڕاندن، بەڕێوەبەری؛ سیستم یان شێوەی حکومەت یان بەڕێوەبەرایەتی یێ 2 کاریگەری، کارتێکەر، باندۆر، شوێندانان 3 (کۆن) چاودێری، کۆنترۆڵ ⟡ 1 حکومت، دولت، اداره؛ سیستم یا روش حکومت یا مدیریت 2 تأثیر(گذاری) 3 نظارت، کنترل

**governess** /ˈgʌvənəs, US -vərn-/ *noun*
1 ژنە مامۆستای تایبەتی 2 (کۆن) ژنی حکومەتدار یان ستانداران، ژنی دەسەڵاتدار یان پارێزگار (**governessy** *adj*) ⟡ 1 معلمەی سر خانه 2 زن حاکم یا فرماندار یا استاندار

**governing** /ˈgʌvənɪŋ, US -vərn-/ *noun, adjective*
1 هەبوونی دەسەڵات، هێز و مافی بەڕێوەبردن، حکومەت، میری، بەڕێوەبەرایەتی، ڕێقەبەری 2 فەرمانگێر، دەسەڵاتگێر، دەسەڵاتدار، فەرمانڕەوا، حوکمدار، حوکمڕان: *The Conservatives were then the governing party* ⟡ 1 حکومت، اداره 2 حاکم

**governing body** *noun*
دەستەی بەڕێوەبەران ⟡ هیأت ادارەکنندگان

**government** /ˈgʌvənmənt, US -vərn-/ *noun*
1 حکومەت، میری، حوکومەت، فەرمانگێری، دەسەڵاتگێری، دەسەڵاتداری، حکومەتداری، فەرمانڕەوایی، حوکمداری، حوکمڕانی، دەستەی بەڕێوەبەرانی حکومەت، فەرمانگێران، دەوڵەت: *the last ◊ to lead/form a government government ◊ Conservative government central/federal -rnment ◊ policies/officials* 2 دەسەڵات 3 شێواز یا ڕێکخستەی بەڕێوەبردن 4 (Government) دەستەی بەڕێوەبەرانی حکومەت یان وڵاتێ، فەرمانگێران، دەوڵەت 5 (ڕێزمان) فەرمانگێری، فەرماندەرێتی، کارتێکەرێتی، پێویستایەتی: پێوەندی نێوان وشەی فەرمانگێر governing و وشەی فەرمانبەر (یان پێبەند) governed (وەک نێوان کاری تێپەر و بەرکارەکەی)، پێوەندی نێوان دوو وشە لە ڕستەیێکدا کە بەکارهێنانی یەکیان پێویست دەکا ئەویدی یان شێوەیێکی تایبەتی particular form هەبێ (یان وەربگرێ، وەک *I saw her in Kurdistan* "her" بەرکار فەرمانبەری کاری "saw" ـە، هەروەها "Kurdistan" فەرمانبەری پیتی پێوەندی "in" ـە) 6 = political science (بنەڕەتی وشەی

1 ڕەنگی گواش 2 وێنەکێشی بە گواش، تابلۆی گواش ⟡ 1 رنگ گواش 2 نقاشی یا تابلوی گواش

**Gouda** /ˈgaʊdə, US ˈguːdə/ *noun*
گوودا، گەودا (جۆرێ پەنیری هوڵەندی) ⟡ گودا

**gouge** /gaʊdʒ/ *noun*
1 ئەسکەنە، دارکوڵ، کۆلینک 2 کون، کووز، شوێن (کە بە ئەسکەنەکاری بە دەست هاتووە) ⟡ 1 اسکنه 2 سوراخ، شیار

**goulash** /ˈguːlæʃ/ *noun*
گولاش (چێشتێکی هەنگاریایی) ⟡ گولاش

**gourd** /gʊəd, gɔːd, US gʊrd, gɔːrd/ *noun*
1 (ڕووەکناسی) کوولەکە 2 ڕووەک یان بڕکەی کوولەکە [*Cucurbita* و تۆخمەکانی تر] 3 قاپێ کە توێکڵی وشکەوەبووی کوولەکەی تیایە ⟡ 1 کدو 2 گیاه کدو 3 گورد

**gourde** /gʊəd/ *noun*
یەکەی بنەڕەتی پارەی هائیتی، بەرامبەر بە سەد centime ⟡ گورد

**gourmand** /ˈgʊəmənd, US ˈgʊrmɑːnd/ *noun*
1 زگبەردەرەوە، چڵێس، زگەڕۆ، زۆرخۆر 2 خۆشخۆر، خۆشخۆراک، خاوەن سەرڕشتە لە خۆراکدا ⟡ 1 شکمو، شکمباره 2 خوشخوراک

**gourmandism** *noun*
1 چڵێسی، زگەڕۆیی، زۆرخۆری 2 خۆشخۆری، خۆشخۆراکی، سەرڕشتە لە خۆراکدا ⟡ 1 شکمویی، شکمبارگی 2 خوشخوراکی

**gourmet** /ˈgʊəmeɪ, US ˈgʊrm-/ *noun*
1 خۆراکناس 2 مەیناس ⟡ 1 غذاشناس 2 شرابشناس

**gout** /gaʊt/ *noun*
1 باداری، جومگێشە (ب.ت. چۆک، بەندەکانی قامک و هتد) 2 دڵۆپ، تنۆک، تکە (خوێن یان جەڵغە) ⟡ 1 نقرس 2 قطره

**goutily** *adverb*
ماسیوانە، بە شێوەیەکی ماسیو ⟡ به طور متورم

**goutiness** /gaʊtinəs/ *noun*
1 ماسین، پەنەمیان، باکردن 2 تووشی جومگێشە یان باداری بوون ⟡ 1 تورم 2 ابتلا به نقرس

**goutweed** *noun*
(ڕووەکناسی) وڕەعەرزیلە، پێیزنە؟ (جاران بۆ دەرمانی باداری gout بەکاردێترا) ⟡ آقطی زمینی

**gouty** /gaʊti/ *adjective*
جومگێشەگرتوو، تووشبوو بە جومگێشە یان باداری، ماسیو، باکردوو ⟡ مبتلا به نقرس، ناشی از نقرس، متورم

**Gov** = governor

**governable** /ˈgʌvənəbl/ *adjective*
لەبەڕێوەبردنهاتوو، شیاو یان شایانی

govern: لــه governer فــەرەنــســی كــۆن، لــه gubernare لاتــین "لێخــوڕین، ئــاژۆتن، ڕانــین، ڕانــدن to steer، بــەڕێــوەبــردن، ڕێــبەری كــردن، بــەڕێدابــردن rule"، لــه kuberman یۆنــانی "لێخوڕین، ئاژۆتن، ڕانین، ڕاندن to steer" ◌ 1 حكومت، دولت 2 سیطره 3 روش یـا سیـستم اداره 4 (Government) دولـت 6 حاكمیت

**governmental** /ˌgʌvn'mentl, US ˌgʌvərn-/ *adjective*
حكـومی، حكومـەتی، مـیری یانـه، دەوڵـەتی: - *governmental actions* ◊ *mental agencies* (governmentally *adv*) ◌ وابسته به دولت

**governmentalism** *noun*
1 حكومـەت گـەری، دەوڵـەت گـەری: تیـۆری لایـەن گـری لـه بـەرەسـەنـدنی پانتایی و ڕادەی چالاكی حكومەت (یان دەوڵـەت) 2 داشـكانەوە بەرەو فراوانبوونەوەی ڕۆڵ و ئەركی حكومـەت ◌ دولت گرایی

**governmentalist** *noun*
حكومەت گەر، دەوڵەت گەر ◌ دولت گرا

**government and binding theory** *noun*, also binding theory
تیــۆری گاڤــێرنمێنت و بینــدینگ، تیــۆری فــەرمـانگێـری و پـێ(وە)بـەندایـەتی، تیـۆری دەسەڵاتداریتی و پێوەبەستایەتی ◌ نظریـەی حاكمیت و مرجع گزینی، نظریەی حاكمیت و وابستگی

**government health warning** *noun*
هۆشداری یان ئاگاداری تەندروستی حكومی ◌ اخطار بهداشت حكومتی

**Government House** *noun*
شوێنی مانەوەی ستانوان یان پارێزگـار ◌ محـل اقامت فرماندار

**government paper** *noun*, also government securities
بەڵـگەنامەی مـیری یـان حكـومی، بۆنـدەكانی مـیری، بۆنـدە حكـومی یـەكان ◌ اسـناد دولتـی، اوراق بهادار دولتی

**governor** /'gʌvənə(r), US -vərn-/ *noun*
1 ستانوان، ستانەوان، پارێزگـار: *a provincial* ◊ *the governor of Arizona* ◊ *governor Governor Bev Perdue* 2 دەسـەڵاتدار، حاكم، حوكمڕان 3 سەرۆك (ئەنیستیتۆ)، ئەندامی دەسـتەی بەڕێوەبـەران 4 (نافـەرمی) باڵادەسـت، سەردەست، گـەورەتر 5 (لە بانگ كردنا) بـەڕێز، جـەناب 6 (ئەندازیاری) ڕێكخـەرە، میزانـه(ك)، میكانیزمێ كه خۆبەخۆ خێرایی، تێمپراچێر و هتد دەزگایـێ ڕێكـدەخا 7 (ڕێژمـان) فـەرمـانگێـر، فـەرمـاندەر، كارتێكەر (governorate *n*) ◌ 1 فرماندار، استاندار 2 حاكم 3 رئیـس، عـضو هیـأت ادارەكنندگان 4 مافوق 5 آقا 6 رگلاتور 7 حاكم، عامل

**Governor General** *noun*, *pl.* Governors General or Governor Generals
سەرستانوان، سـەرپارێزگار، پارێزگـاری گـشتی، ستانوانی گـشتی (Governor-Generalship *n*) ◌ فرماندار كل

**governorship** *noun*
1 ستانوانی، پارێزگاری، پارێزگاریتی، پلەوپایـه و ئەرك و پەیوری پارێزگـاری 2 دەسـەڵاتداری، دەسـەڵاتداریتی، میریـتی، فـەرمـانڕەوایـی، حـاكمیتی ◌ 1 فرمـانداری، پـست یـا وظیفـەی فرمانداری 2 حاكمیت

**Govt** = government

**gowan** /'gaʊən/ *noun*
(ڕووەكناسـی، سـكاتلەند) گوڵـی مینـا، چـاوان، چاوپـشیلە (gowany *adj* ؛gowaned *adj*) ◌ گل داوودی

**gowk** /gaʊk/ *noun*
1 كەسێكی گەوج 2 كوكو، یاكەریم، كۆترەپەپوو، كۆترەنەخشینە ◌ 1 آدم احمق 2 فاخته

**gown** /gaʊn/ *noun*
1 كراسی ژنانە، قەسری 2 بەرگی نەخۆشخانە كە كۆمەڵی نەشتەرگەران یان نەخۆشان لەبەری دەكـەن 3 كـەوا، عـەبا، جبـە، بـاڵاپۆش 4 جلـی (فشی) تایبـەتی دادگـەران، مامۆسـتایان، پیاوانی زانكۆ و خوێندكارانی زانـستگا 5 ئەندامانی زانكۆ لە بەرامبەر دانیشتووانی شاردا (بڕوانە town) ◌ 1 پیراهن زنانه 2 روپوش 3 جبه، ردا 4 و 5 گون

**gowned** /gaʊnd/ *adjective*
عابـاپۆش، عەباپۆشـیو، جبەلەبـەر(كـردوو)، قەسریلەبەر(كردوو) ◌ ردا یا پیراهن زنانه پوشیده

**gownsman** /gaʊnzmən/ *noun*, *pl.* -wnsmen
جبەپۆش، عاباپۆش، عابالەبەر ◌ رداپوش

**goy** /gɔɪ/ *noun*, *pl.* goyim /'gɔɪɪm/ or goys
(نافـەرمی و سـووكانە) نـاوێكی جوولەكـە بـۆ كەسێكی ناجوولەكە ◌ گوی

**GP** /ˌdʒi: 'pi:/ *abbreviation* general practitioner
جی‌پی ◌ جی‌پی

**GPA** /ˌdʒi: pi: 'eɪ/ *abbreviation* grade point average
جی‌پی‌ئێی ◌ جی‌پی‌ای

**Gp Capt** *abbreviation* group captain

**GPO** /ˌdʒi: pi: 'əʊ, 'oʊ/ *abbreviation* General Post Office
جی‌پی‌ئۆ ◌ جی‌پی‌او

**G protein** *noun*, guanosine triphosphate-binding *protein*
پۆلـە پرۆتینێكـی بـەردەی خانـەیـی cell membrane ◌ پروتئین جی

**GPS** /ˌdʒi: pi: 'es/ *abbreviation* global positioning system
جی‌پی‌ئێس، ڕێكخـستەی شـوێن‌دۆزی جیهـانی

(سیستمی کە لەودا سیگناڵ و پەیامەکان لە ساتەلایتەوە بۆ دەزگایەکی تایبەتی دەنێردرێ تاکوو جێگا و شوێنی کەس یا شتێ لەسەر عەرز بەوردی پیشان بدرێ) ۞ جی‌پی اس

**GR** /ˌdʒiː ˈɑː(r)/ *abbreviation* Latin *Georgius Rex*

جی‌ئار (ب.ت. لەسەر کۆینەکانی شاجۆرج) ۞ جی‌آر

**gr** = GM

**Graafian follicle** /ˈgrɑːfɪən/ *noun*

دەمەژە یان فۆلیکۆلی گراف: پێکهاتەیێکی پرشلەی نێو هێلکەدان کە لەنێو ئەودا هێلکۆکە بەرلە هێلکۆکەدانان پەرە دەسێنێ (لە ناوی Regnier de *Graaf* توێکاری هولەندی (مەرگ 1673) ۞ فولیکول گراف

**grab** /græb/ *noun*

1 رفاندن، فڕاندن، پڕپیاکردن، راپسکاندن، قۆستنەوە 2 شالاو، پەلامار، هێرش 3 قولاپ، قەلانگ ۞ 1 ربایش 2 حمله، یورش 3 چنگک

**grab bag** *noun*, also lucky dip

چێشتی مجێور، دەستە شتێکی تێکەڵاو ۞ مجموعه‌ی اشیا مختلط

**grabber** *noun*

رفێنەر، فڕێنەر، راپسکێنەر، پڕپیاکەر، رەفێنۆک ۞ رباینده

**grabby** /ˈgræbɪ/ *adjective*

چلێس، چاوچنۆک ۞ حریص

**graben** /ˈgrɑːb(ə)n/ *noun, pl.* same or grabens

(زەویناسی) کەندال، کەندەڵان، کەند، رۆچوویی، نغرۆ، قولکە، چاڵ (لە توێکڵی زەویدا)، نشستاڵ، نشستەدەرە (بەش یان کەرتێکی رۆچووی توێکڵی زەوی یان تەنێکی ئاسمانی (وەک هی مانگ) کە لە نێوان دوو قەڵەشت (ی لێژ (ی هاوتەریب) دایە، درێژایی ئەم دۆڵ و دەرانە لەچاو پانی‌یان زۆرترە، لە هەرە بەناوبانگی ئەم دەرانە هی دۆڵ یان دەرەی رووباری ئۆردۆن، دەریای مردوو و دەریای سوورە؛ بنەڕەت: لە *Graben* ئەڵمانی "کەند") ۞ گودال، فروزمین

**grace** /greɪs/ *noun*

1 جوانی، چەلەنگی، شۆخی، رندی، رێک‌وپێکی، ئەندامڕێکی، لەنجە، لەنجەولار، لەخت‌ولار، ناسکی، ئەدا، ئان 2 سەنگینی، قورسی، مەندی 3 ئەدەب، رەوشت، ماریفەت 4 چاکە، باشی، پیاوەتی، سایە، یارمەتی، رەحمەت، خۆشەویستی، بەزەیی، رەحمەت یا بەزەیی خودا، خواپێداوە 5 نیاز 6 دەرفەت، فرسەند، دەلیفە 7 (پێش و پاش نان) شوکرانەبژێری 8 (Grace) جەنابی بەرێز 9 (graces) هەڵس‌وکەوت، رەفتار، ئاکار ۞ 1 زیبایی، ظرافت 2 وقار 3 نزاکت 4 لطف، مرحمت، توفیق، لطف خدا 5 نیت 6 فرصت 7 شکرانه 8 (Grace) عالی‌جناب 9 (در جمع) رفتار

**grace-cup** /ˈgreɪs kʌp/ *noun*

پیالەی (خواردنەوە) دوای شێو ۞ گیلاس مشروب پس از شام

**graceful** /ˈgreɪsfl/ *adjective*

1 جوان، نازەنین، بەئەدا 2 شۆخ‌وشەنگ، بەلەخت‌ولار، خۆش‌ئەندام، رێک‌وپێک 3 قورس، سەنگین، مەند 4 سەرنجڕاکێش، دڵڕفێن، خۆش 5 بەڕەوشتانە ( gracefully /ˈgreɪsfəli/ *adv*: بە مەندی، مەندانە، قورسانە، بەڕەوشتانە؛ gracefulness /ˈgreɪsflnəs/ *n*: 1 جوانی، نازەنینی 2 بەڕەوشتی، تۆرە) ۞ 1 زیبا 2 خوش‌پیکر 3 موقر 4 جذاب 5 مؤدبانه

**graceless** /ˈgreɪsləs/ *adjective*

1 بێ‌ڕەوشت، ناحەز، بێ‌تۆرە، دوور لە رەوشت، بێ‌شەرمانە، بێ‌ئەدەبانە، بێ‌ڕەوشتانە: immoral: unregenerate: *a graceless, angry young man* ◊ *a gracious host* 2 یەکنەگر(ەوە)، ناحەز، جوان نییە، نەگونجاو، نارێک(وپێک: *graceless dancing*؛ gracelessly /ˈgreɪsləsli/ *adv*: بێ‌ڕەوشتانە، بێ‌شەرمانە: *Martha was slumped gracelessly in an armchair*؛ gracelessness *n*: 1 بێ‌ڕەوشتی، بێ‌ئەدەبی 2 نارێکی، شپرزەیی) ۞ 1 بی‌ادب، دور از نزاکت 2 بی‌تناسب

**grace note** *noun*

نۆتی جوانی (نۆتی سەرەکی ئاواز یا هارمۆنی‌یێ نییە) ۞ نت زیبایی

**Graces** *noun*

گرەیسیز: سێ خوشکە خواژنی جوان کە بەزەیی، جوانی و نازەنینی دەدەن بە مرۆڤەکان، میتۆلۆژی یۆنانی ۞ گریسز

**gracile** /ˈgrasɪl, US ˈgrasʌɪl/ *adjective*

(مرۆڤناسی) باریک، تیشکەڵە، زراف ۞ باریک

**gracility** /grəˈsɪlɪti/ *noun*

(کۆن) باریکی، تیشکەڵەیی، زرافی ۞ باریکی

**gracious** /ˈgreɪʃəs/ *adjective*

1 دڵسۆز، دڵنەرم، بەبەزەیی، دڵنەوا: *a gracious lady* 2 گەورە، لە رووی گەورەیی یان پیاوەتی‌یەوە، بەسەرکەرەوە 3 (خودا) دلۆڤان، بەدەهندە، بەڕەحم: *a gracious act of God* 4 بەڕەوشتانە 5 شایانە، بەشکۆ ۞ 1 مهربان 2 بزرگوار، از سر لطف 3 رحیم 4 مؤدبانه 5 مجلل

**graciously** /ˈgreɪʃəsli/ *adverb*

لە رووی گەورەیی‌یەوە، بەبەزەیی‌یانە، دڵسۆزانە ۞ از سر لطف

**graciousness** /ˈgreɪʃəsnəs/ *noun*

1 دڵسۆزی، دلۆڤانی، دڵنەرمی، بەبەزەییتی 2

بەدەهەنــدەیی 3 گــەورەیی ◌ 1 مهربـــانی 2 بخشندگی 3 بزرگواری

**grackle** *noun*
1 (باڵندەناسی) مەلی دەنگ‌خۆشی ئەمریکایی لە تــیرەی رەشیــشــە [*Quiscalus quiscula*] و جــۆرەکــانی تــر] 2 جــۆری mynah ئاســیایی [*Gracula* و تۆخمەکانی تر] ◌ گراکل

**grad** /græd/ = graduate

**gradability** /ˌɡreɪdəˈbɪləti/ *noun*
لــەگۆڕانھــاتوویی، لەپلــە(پلــە)ھــاتوویی، لــە پلاندنھاتوویی (لە نێوان دوو شێوەی ئاوەڵناوی بەراوردکاری comparative و باڵا یــان ھــەرەیی superlative(دا) ◌ قابلیت تغییر، درجه‌بندی‌پذیری

**gradable** /ˈɡreɪdəbl/ *adjective*
لـــەگۆڕانھـــاتوو، (ڕێزمـــان، ئاوەڵـــناو) لەپلە(پلە)ھاتوو، لەپلاندنھاتوو (دژەکەی non-gradable *adj*) ◌ قابل تغییر، درجه‌بندی‌پذیر

**gradable adjective** *noun*
ئاوەڵناوی لەپلــە(پلــە)ھــاتوو یــان لەپلانــدنھــاتوو ◌ صفت درجه‌بندی‌پذیر

**gradable pair** *noun*
جووتی لەپلە(پلە)ھــاتوو یــان لەپلانــدنھــاتوو ◌ زوج درجه‌بندی‌پذیر

**gradation** /ɡrəˈdeɪʃn/ *noun*
1 گۆڕانی بەرەبەرە، پلەپلەگۆڕان: *gradations of colour* 2 دوابەدوای‌یەک‌ھاتن، زنجیرەیی 3 پلانــدن، پلەبەنــدی، ئەندازانــدن، پلەپلــەکردن، چین‌چین‌کردن، چیناندن، پلە، رادە 4 قۆناخ 5 (زمانــەوانی) ablaut = ◌ 1 تغییــر تــدریجی 2 تسلسل 3 درجه‌بندی، درجه 4 مرحله

**gradational** /ɡrəˈdeɪʃənl/ *adjective*
سەربە گۆڕانی بەرەبەرە ◌ وابسته به تغییر تدریجی

**gradationally** *adverb*
بە شێوەیەکی پلەپلە، لە بەرەوە ◌ به طور تدریجی

**grade** /ɡreɪd/ *noun*
1 پلە، نمرە، چین، ئەندازە، چینە، توێژ: *All the materials used were of the highest grade* 2 پلەی سەربازی 3 قۆناخ 4 رادە، پایە، تەراز، ئاست: *She's still only on a secretarial grade* 5 پۆل، ساڵی خوێندن، نمرە، نیشە 6 جۆر، چەشن، ئاوا 7 (ماڵات) جۆری متوربەکراو 8 (ب.ت. ڕێگا یا ڕێی ئاسن) لێژی، ئاستی لێژایی، رادەی لێژی، سەرەوخواری ◌ 1 درجه، مرتبه 2 درجه‌ی نظامی 3 مرحله 4 میزان 5 کلاس، نمره 6 نوع 7 نوع اصلاح‌شده 8 شیب، درجه‌ی شیب

**grade crossing** = level crossing

**graded** /ˈɡreɪdɪd/ *adjective*
بەرەبــەرەیی، پلێنــراو، پلەپلــەکراو، ئەنــدازێنراو، پلەبەندی‌کراو: *-d tests for language students* ◊ *-ed doses of a drug* ◌ تدریجی، مدرج

**gradely** *adjective*
بەڕێز، جێی حورمەت، قورس ◌ محترم، باوقار

**grade point average** *noun*
نێوبڕی نمرەکانی خوێندکارێ لە یەک ماوەدا (لە سیستمی خوێندنی ئەمریکادا): *The law school required a minimum grade point average of 2.6 (on a 4. • 0 scale)* ◌ جی‌پی‌ای

**grader** *noun*
1 نمرەدانــەر، نمــرەدەر 2 گریــدەر: دەزگــای تەختانــدن (ب.ت. ڕێگاوبــان) 3 (لــە لێکــدانا) شــاگردی پۆلێکی تایبــەتی ◌ 1 نمــرەگــذار 2 گریدر 3 گریدر

**grade school** = elementary school

**grade schooler** *noun*
شــاگرد یــان قوتــابی خوێنــدنگای ســەرەتایی ◌ محصل دبستان

**grade separation** *noun*
شــوێنی یەکتربــڕین، جەمســەر (ڕێــی ئاســن، ئەمریکا) ◌ محل تقاطع

**grade teacher** *noun*
مامۆستا (خوێندنگای سەرەتایی) ◌ آموزگار

**gradient** /ˈɡreɪdiənt/ *noun*
لێژ، سەرەوخواری، رادەی لێژی، ئاستی لێژایی ◌ شیب، میزان شیب

**gradienter** *noun*
لێژپێو، لێژپێو ◌ شیب‌سنج

**gradine** /ɡrəˈdiːn/ *adjective*, also gradin /ˈɡreɪdɪn/
1 رەفحەی پشت ئالتار یا مێحراب 2 پلە، رادە 3 سەکۆ ◌ 1 طاقچه‌ی پشت محراب 2 رتبه 3 سکو

**gradiometer** /ˌɡreɪdɪˈɒmɪtə/ *noun*
لێژ(ی)پێو ◌ شیب‌پیما

**grad school** = graduate school

**gradual** /ˈɡrædʒuəl/ *adjective*
1 وردەوردە، بەرەبەرە: *a gradual change in the climate* 2 (لێــژی) نــەرم، کــەم، ســووک 3 گێڕانەوە، سەندنەوە؛ gradually /ˈɡrædʒuəli/ *adv*: کەم‌کەم، هێدی‌هێدی، وردەوردە، بەرەبەرە، نەرمەنەرمە، چکەچکە، لە بەرەوە؛ gradualness (*n* ◌ 1 تدریجی 2 آرام 3 تهلیل

**gradualism** /ˈɡrædʒuəlɪzəm/ *noun*
سیاسەتی گۆڕانی بەرەبەرەی کۆمەڵگا لەچاو گۆڕانی کتوپڕ یان شۆڕش، بەرەگۆڕانخوازی، سیاسەتی وردەگۆڕی ◌ گرادوالیسم

**gradualist** /ˈɡrædʒuəlɪst/ *noun*
بــەرەگۆڕانخــواز (gradualistic *adj*) ◌ گرادوالیست

**graduality** *noun*
وردەوردەبوون، بەرەبــەرەیی، ناکــتوپــڕیتی ◌ حالت تدریجی

**graduate** /ˈɡrædʒuət/ *noun, adjective*

1 لیسانس، بەکالۆر، بەکالیۆر، هەڵگری
بڕوانامەی زانکۆیی، دەرچوو، لەخوێندنەوەبوو،
خوێندن تەواوکردوو: *a graduate in history* ◊
*a -te student/course* ◊ *a science graduate*
2 دوای بەکالیۆر، سەربە ماستێر یان دوکتۆرا ۞
1 لیسانسیه، فارغ‌التحصیل 2 بعد از لیسانس

**graduated** /'grædʒueɪtɪd/ *adjective*
1 بەرەبەرەیی، وردەوردە 2 پلێنراو، چینەکراو،
پلەپلەکراو، ئەندازێنراو، پلەبەندی کراو،
چین‌چین کراو، پێوەرەکراو (ئامێر یان
شووشەیێ)، calibrated: *a graduated jar* ۞
1 تدریجی 2 مدرج

**graduated pension** *noun*
مووچەی خانەنشینی، خانەنشینانە ۞ حقوق
بازنشستگی

**graduated tax** *noun*
بەرەباج، باجی بەرەبەرەیی ۞ مالیات تدریجی

**graduate school** *noun*, also informal grad school
خولەکانی ماستێر و دوکتۆرا ۞ دوره‌های
فوق‌لیسانس و دکتری

**graduation** /ˌgrædʒu'eɪʃn/ *noun*
1 دەرچوون، لە خوێندنبوونەوە، چراغبوون: *It*
*was my first job after graduation* 2
ئاهەنگ یا سووڕانی دەرچوون (یا لە
خوێندنبوونەوە): *My* ◊ *graduation day*
*whole family came to my graduation* 3
پلە، چینە ۞ 1 فارغ‌التحصیلی 2 جشن
فارغ‌التحصیلی 3 درجه

**graduator** /'grædʒuətə(r)/ *noun*
پلێنەر، پلەدانەر، ئەندازێنەر، دابەشکەر (پلە) ۞
مدرج

**gradus** /'greɪdəs/ *noun*
فەرهەنگی عەرووزی (یۆنانی و لاتینی)،
فەرهەنگی هۆنراوە و پەخشانی یۆنانی و لاتین
کە جاران لە ئینگلتەرە دەوتراوە ۞ فرهنگ عروضی

**Graecism** /'gri:sɪz(ə)m, US 'grʌɪ-/ *noun*, also Grecism
زاراوە یان بێژەی یۆنانی (ب.ت. لە زمانێکی تر)
۞ اصطلاح یونانی

**Graeco-** /'gri:kəʊ-, US -koʊ/ (also US Greco-) *prefix*
پێشگر: یۆنانی، ویتنانی، سەربە یۆنان:
*Graecophile* (بنەڕەت: لە *Graecus* لاتین) ۞
پیشوند: یونانی، وابسته به یونان

**Graeco-Roman** *adjective*
1 سەربە خەڵکی یۆنانی و ڕۆمی کۆن 2 ئاماژە
بە شێوازی زۆرانبازیێ کە گرتنی ژێرپشتێنە
قەدەغەیە ۞ 1 وابسته به یونانیان و رومی‌های
باستان 2 گراسیو رومان

**graffiti** /grə'fi:ti/ *noun*, *sing*. graffito /-təʊ/
دروشم، نووسراوە یان کێشراوە لەسەر دیوار
ب.ت. سیاسی یان هەرزە: *The subway was*
*covered in graffiti* ◊ *Someone had*
*scrawled graffiti all over the school walls*
۞ نوشته یا نقاشی بر روی دیوار

**graft**[1] /grɑ:ft, US græft/ *noun*
1 (ڕووەکناسی و نەشتەرگەری) تووز، چووز،
پەیوەند، متوربە، پەیوەست: *A healthy shoot*
*should form a strong -aft* 2 جێگای متوربە،
فتروونە، پەیوەستگا 3 نەمام، چووز، خەڵف،
قەڵەمە 4 ڕووەکی متوربەکراو 5 (پزشکی)
پارچەیێ شانەی زیندوو کە بە شتەرگەری
متوربە یان پەیوەست دەکرێ 6 نەشتەرگەرییێ
کە شانەیێ پەیوەست دەکرێ ۞ 1 پیوند 2 جای
پیوند 3 قلمه 4 گیاه پیوندی 5 گرافت

**graft**[2] /grɑ:ft, US græft/ *noun*
1 پارتی‌بازی 2 بەرتیل، بەرتیل‌خۆری، دزی،
دەسکیسی: *He promised an end to graft*
*and corruption in public life* ۞ 1
پارتی‌بازی 2 رشوه، اختلاس

**graft**[3] /grɑ:ft, US græft/ *noun*
کاری گران یا سەخت، کردوکۆش، هەوڵ،
جنگەکرێ، کرناوکرن: *Their success was the*
*result of years of hard graft* ۞ کار شاق،
سخت‌کوشی

**graft**[4] /grɑ:ft, US græft/ *noun*
دەمەپێمەڕەیێ (گڵ کە دەیگرێ و هەڵەکەنرێ)
۞ گرافت

**graftage** /grɑ:ftɪdʒ/ *noun*
1 متوربەکردن، متوربانـدن، پەیوەندکردن،
متوربەکاری، پەیوەستکردن 2 بنەماکانی متوربە
یا پەیوەست ۞ 1 عمل پیوند زدن 2 اصول پیوند

**grafter** *noun*
1 متوربانـدن، متوربەکردن، تووزکردن،
پەیوەستکردن 2 متوربێنەر، متوربەگەر،
پەیوەستکار، متوربەکار 3 بەرتیل‌خۆر 4 مرۆی
تێکۆشەر یان زەحمەتکێش، مرۆی ڕەنج‌کێش
۞ 1 عمل پیوندزدن 2 پیوندزننده 3 رشوه‌خوار 4
آدم سخت‌کوش

**grafting-knife** /'grɑ:ftɪŋ naɪf/ *noun*
چەقۆی متوربە یان پەیوەند ۞ چاقوی پیوندزنی

**graham** = wholemeal

**Grail** /greɪl/ *noun*, also Holy Grail
کاسە یان جامی پیرۆز (لە دوایین شێودا Last
Supper) ۞ جام مقدس

**grain** /greɪn/ *noun*
1 دانەوێڵە، پەتلە، درکەدو، دغڵ، دەغڵ‌ودان،
وشکەدان، وردەدان، دانوو، دەنک، دان، تۆو، توو
2 جۆیێ، برێ، برێکی زۆر کەم 3 (دار) بار یان
دۆخی ڕەگ، باری ڕەگە، باری ریشاڵ 4 (بەرد)
ڕەگە، دەمار، چین 5 ڕەنگ (جێگیر یان

کالـەوەنەبوو)، خۆرەنـگ 6 (خـوازە) سروشـت، بـار، دۆخ، وەزع 7 تـارێکی یـان زبـر و چرچی دیـوی دەرەوەی چـەرم 8 گـەنم، گەنمـە، دەنـک (چکۆلـەترین یەکـەی کێشـان لـە زۆر سیـستمی پێوان‌دا، بەرامبەر بە 0.0648 گرەم، بۆ کێشانی دەوا و دەرمـان بـەکاردێترێ؛ *n* grainer: 1 دەنکێنەر، دەنکەدەنکەکەر 2 برینگ؛ grainless (*adj*) ۞ 1 حبوبات، غلـه، غـلات، دانـه 2 خـرده، مقـدار بـسیار انـدک 3 گـرین 4 رگـه 5 رنـگ 6 (مجازی) مشـرب، حالت 7 گرین 8 گندم

**grain alcohol** = alcohol

**-grained** /greɪnd/ *adjective*

(لە لێکدانا) 1 ـدان، ـدەنک 2 خاوەنی ڕەگێ لە جۆری تایبەت ۞ (در ترکیب) 1 ـدانـه 2 دارای رگه از نوع خاص

**grain field** *noun*

کێلگەی گەنم، گەنمەلان، گەنمان ۞ گندم‌زار

**grain rust** *noun*

ژەنگی دانەوێلە یان گەنم ۞ زنـگ حبوبـات یـا گندم

**grain(s)** /'greɪn(z)/ *noun*

رم یا نەیزەی شەنەیی (بۆ راوەماسی) ۞ گرینیز

**grains of Paradise** *noun, pl.*

دەنـک و دانی گیـاێکی ئـەفریکای رۆژاوا، وەک بـەهـارات و دەرمـانی گیـایی بـەکـاردێترێ [*Aframomum melegueta*] ۞ نوعی گیاه

**grainy** /'greɪni/ *adjective* (grainier, grainiest)

1 دەنکەدەنکـە، دەنکـاوی، دەنـک‌دار 2 (دار) خاوەنی ریشـاڵ یان رەگـەی دیـار (graininess *n*) ۞ 1 دانه‌دانه 2 (درخت) دارای رگه‌ی برجسته

**gralloch** /'graləək/ *noun*

نـاوزگی ئاسـکەمردوو (بنـەڕەت: لـە *grealach* گەیلی سـکاتلەندی) ۞ گرالوچ

**gram**[1] /græm/ *noun*, Brit. also gramme

گـرەم (کورتەکـەی: g؛ بنـەڕەت: لـە *gramme* فەرەنسـی، لە late Latin *gramma* "سـەنگ یان کێشێکی کەم a small weight") ۞ گرم

**gram**[2] /græm/ *noun*

نۆک (بنەڕەت: لە *granum* لاتین "دان grain") ۞ نخود

**-gram** *suffix*

پاشـگر: 1 یەکـەی میترپێوی کێش 2 نووسـراو، کێشراو: *telegram* ،*chronogram* (بنـەڕەت: لە *gramma* یۆنـانی‌یـەوە "شـتێکی نووسـراو، پیتی ناوبێ") ۞ پسوند: 1 واحد متریک وزن 2 نوشـته، نگاشت، نقاشی‌شده

**grama** *noun*, also grama grass

جـۆرێ گیـای رۆژاوای ئـەمریکـا [تـوخم *Bouteloua*] ۞ نوعی گیاه

**gramarye** *noun*

رێزمان ۞ دستور زبان

**gram-atom weight** *noun*, also gram-atom

کێشی گرام-گەردیلە یا گرام-ئەتۆم: کێشی توخمێکی کیمیایی بە گرەم کە بەرامبەر بە کێشی گـەردیلـەیـی یـان ئـەتـۆمی‌یـەتی (وەک گرام-گەردیلەی ئۆکسیژین 16 گرامە) ۞ وزن گرام‌اتم

**gramercy** /'græməsɪ/ *interjection*

(کۆن) سپاس(ت) ۞ سپاس‌گزارم

**gramicidin** /ˌgramɪ'sʌɪdɪn/ *noun*

جۆرێ ئانتی‌بیوتیکی بەکتریایی کە بەربلاوانە بەکاردێترێ و بەهۆی بەکتریای گلی (*Bacillus brevis*) بەرهەم دێترێ ۞ گرامیسیدین

**graminaceous** /ˌgramɪ'neɪʃəs/ *adjective*, also gramineous

گیایی، گژوگیایی، گیائاسا (gramineousness *n*) ۞ علفی، علف‌مانند

**graminivorous** /ˌgramɪ'nɪv(ə)rəs/ *adjective*

◊ گیـاخۆر: *graminivorous locusts* ۞ *graminivorous birds* علف‌خوار

**gramma** *noun*

(نافەرمی و ئەمریکا) دایەگەورە، نەنک، پیرک، ماما ۞ مادربزرگ

**grammalogue** /'graməlɒg/ *noun*

نیشانە، هێما، بەرژەنگ، رەمز ۞ نماد، رمز

**grammar** /'græmə(r)/ *noun*

1 رێزمان: ◊ *the basic rules of grammar* 2 کتـێبی رێزمـان، رێزمان‌نامە: *Kurdish grammar* ◊ *a Kurdish grammar* 3 کۆمەڵە بۆچوونێکی دەستووری دەربارەی بەکارهێنانی دروستی زمانێ 4 رەگەزە بنەڕەتی‌یەکانی مەڵبەندێکی ناڵیج ۞ 1 دستور زبان 2 کتاب دستور زبان 3 و 4 گرامر

**grammarian** /grə'meərɪən, US -'mer-/ *noun*

رێزمانەوان، شـارەزا یـان زانـای رێزمـان، رێزمان‌زان ۞ دستورنویس، متخصص دستور

**grammar school** *noun*

1 (لـە بریتانیـا) خوێنـدنگای ئامـادەیی یـان دواناوەندی 2 (جاران، لە ئەمریکا) خوێندنگای سەرەتایی ۞ 1 دبیرستان 2 مدرسه‌ی ابتدایی

**grammatical** /grə'mætɪkl/ *adjective*

1 رێزمانی، سەربە رێزمان 2 دروست، راست (بە پێی ریاکانی رێزمان؛ grammatically /-kli/ *adv*: لەباری رێزمانی‌یەوە، لە بواری رێزمانەوە؛ grammaticalness *n*: رێزمانی‌بوون) ۞ 1 وابسته به دستور زبان 2 صحیح

**grammatical category** *noun*

بابەتی رێزمانی ۞ مقوله‌ی دستوری

**grammatical change** *noun*

گۆڕانی ڕێزمانی ۞ تغییر دستوری

**grammatical competence** *noun*

توانستی ڕێزمانی ۞ توانش دستوری

**grammatical concept** *noun*

چەمکی ڕێزمانی ۞ مفهوم دستوری

**grammatical core** *noun*

ناوکە یان ناوک یا نێوکی ڕێزمانی، کرۆکی ڕێزمانی ۞ هستەی دستوری

**grammatical deviance** *noun*

لادانی ڕێزمانی ۞ انحراف دستوری

**grammatical error** *noun*

هەڵەی ڕێزمانی ۞ خطای دستوری

**grammatical form** *noun*

شێوەی ڕێزمانی ۞ شکل دستوری

**grammatical function** *noun*

ئەرکی ڕێزمانی ۞ نقش دستوری

**grammaticality** *noun*

ڕێزمانیبوون، ڕێزمانێتی ۞ دستوریبودن

**grammaticalization** *noun*

ڕێزمانیکردن، ڕێزمانێتی ۞ دستوریکردن

**grammatical meaning** *noun*

واتای ڕێزمانی ۞ معنای دستوری

**grammatical morpheme** *noun*

مۆرفیمی ڕێزمانی ۞ تکواژ دستوری

**grammatical phonetics** *noun*

دەنگناسی ڕێزمانی ۞ آواشناسی دستوری

**grammatical process** *noun*

ڕەوت یان پرۆسەی ڕێزمانی ۞ فرایند دستوری

**grammatical relations** *noun, pl.*

پێوەندییە ڕێزمانییەکان ۞ روابط دستوری

**grammatical relationship** *noun*

پێوەندی ڕێزمانی ۞ رابطەی دستوری

**grammatical sentence** *noun*

ڕستەی ڕێزمانی ۞ جملەی دستوری

**grammatical structure** *noun*

پێکهاتەی ڕێزمانی ۞ ساختار دستوری

**grammatical system** *noun*

دەزگا یان سیستمی ڕێزمانی ۞ دستگاه دستوری

**grammatical theory** *noun*

تیۆری ڕێزمانی ۞ نظریەی دستوری

**grammatical unit** *noun*

یەکەی ڕێزمانی ۞ واحد دستوری

**grammatical word** *noun*

وشەی ڕێزمانی ۞ واژەی دستوری

**gramme** (Brit.) /græm/ = gram

**gram molecular weight** *noun*, also gram-molecule

کێشی گەردی بەپێی گرەم، گەردی گرەم ۞ مولکول گرم

**Grammy** *noun, pl.* Grammys or Grammies

گرامی: هەریەک لە خەڵاتی ساڵانەی ئاکادیمیای نیشتمانی ئەمریکا (تێکەڵەی Emmy + gramophone) ۞ گرامی

**Gram-negative** = Gram stian

**gramophone** /'græməfəʊn, US -foʊn/ *noun*

قەوان، بێژەک، گرامافۆن (gramophonic *adj*) ۞ گرامافون

**gramp** *noun*, also gramps, grampy

(نافەرمی) باپیرە، باوەگەورە ۞ پدربزرگ

**Gram-positive** = Gram stian

**grampus** /'grampəs/ *noun, pl.* grampuses

1 گاماسی، گرامپوس (گیانەوەرێکی دەریایی دولفینئاسا [*Grampus griseus*]) 2 جۆرێ دووپشکی زلەی باشووری ئەمریکا [*Mastigoproctus giganteus*] 3 مرۆڤی سیخن، لرخن ۞ 1 گرامپوس 2 نوعی عقرب 3 آدمی که با صدا نفس میکشد

**Gram stain** *noun*, also Gram's stain or Gram's method

1 تەکنیک و شێوەیێکی ڕەنگاندنی جیاوازییە سەرەتاییەکانی بەکتریا نێوان دوو دەستە یان بابەت (Gram-negative "گرامی نەرێنی یان نەیێنی" و Gram-positive "گرامی ئەرێنی") 2 ئەو ماکە کیمیاییانەی کە لەم شێوەیەدا بەکاردێتریێ (بنەڕەت: لە ناوی پزشکی دانمارکی Hans C. J. *Gram*) ۞ گرام استین

**gran** /græn/ *noun*

(نافەرمی و لە بریتانیا) نەنک، دایەگەورە ۞ مادربزرگ

**granadilla** /gran-/ *noun*, also grenadilla

میوە یان بەری شیرینتۆم ۞ میوەی گل ساعتی

**granary** /'grænəri/ *noun, pl.* granaries

1 عەماری دەغڵودان، شوێنی گەنم تیاهەڵگرتن 2 ناوچەی دەغڵ(گەنم)لێیهەڵکەوتوو 3 سەرچاوەی سەرەکی، چاڤکانی بنگەهی ۞ 1 انبار غله 2 منطقەی غلەخیز 3 منبع اساسی

**granary bread** *noun*

نانی دەغڵ ۞ نان غله

**grand** /grænd/ *adjective* (grander, grandest), *noun (pl.* same)

1 *adj* گەورە، مەزن، کەڵنگ، بەشکۆ، شکۆمەند: *The wedding was a very grand occasion* 2 *the Grand Duchess Elena* ◊ زۆرچاک، 3 *Thanks. That'll be grand!* :یەکجار باش *a grand* :هەرەگەورە، گەورە 4 *design/plan/strategy* سەرەکی، گرنگ، بەرکەفتی 5 گشت، هەموو 6 بەڕێن، بەربلاو 7 خۆپێزلانە 8 (ماف) ڕەشت *n* 1 گەورەپیانۆ 2 (پۆند یان دۆلار) هەزاری grandly /grændli/ *adv*: بە گەورەیی، بە شکۆوە، بە شێوەیێکی بەشکۆ، بەشکۆیانە، شکۆمەندانە؛ grandness

/grændnəs/ *n* :گـەورەیی، مـەزنی، شـکۆ، دەبدەبە : (*the grandness of the surroundings*
◌ 1 *adj* بزرگ، اعظم، مجلل 2 عالی 3 عظیم 4 اساسی، مهم 5 کل 6 گسترده 7 متکبرانه 8 (حقوق) جدی *n* 1 پیانوی رویال 2 هزاری

**grandad** /'grændæd/ *noun*
(نافەرمی) باوەگەورە ◌ بابابزرگ

**grandaddy** /'grændædi/ *noun*
باپیرە، باوەپیرە، باوەگەورە ◌ بابابزرگ

**grandam** /'grændam/ *noun*, also grandame, archaic term for grandmother

**grand-aunt** /'grænd ænt/ *noun*
پووری باوک یا هی دایک ◌ خالەی پدری یا مادری، عمەی پدری یا مادری

**grandchild** /'græntʃaɪld/ *noun*, *pl.* grandchildred
نەوە، زازا ◌ نوە

**grand cru** /grɒ̃ 'kru:, French gʀɑ̃ kʀy/ *noun*, *pl.* grands crus pronunc. same
(پتر فەرەنسە) باشترین مەی، بادەی هەرەچاک (بڕوانە premier cru) ◌ عالیترین شراب

**granddad** = grandad

**granddaddy** /'grændædi/ = grandaddy

**granddaughter** /'grændɔ:tə(r)/ *noun*
نەوە، زازا (کچ) ◌ نوە

**grand duchess** *noun*
1 (لـە چەنـد بەشـێکی ئـەوروپا و ب.ت. لـە رابـردوودا، ژن) نیمچـە دەسـەڵاتداری حکومەتێکی چکۆلانە 2 کچی تزار ◌ 1 گراند دوشس 2 دختر تزار

**grand duke** *noun*
1 (لـە چەنـد بەشـێکی ئـەوروپا و ب.ت. لـە رابردوودا) نیمچـە دەسـەڵاتداری حکومـەتێکی چکۆلانە 2 کوڕی تزار ◌ 1 گراند دوک 2 پسر تزار

**grande dame** /grɒ̃d 'dam/ *noun*
سالارەژن، خانم(ە گەورە) ◌ زن بانفوذ

**grandee** /græn'di:/ *noun*
1 (لـە سـپانیا و پۆرتوگـال) گـەورەپیاو، مـیر، شازادە 2 پایەبەرز (لەباری کۆمەڵایەتییەوە) ◌ 1 شاهزادە 2 بلندمرتبە

**grandeur** /'grændʒə(r), US -djə(r)/ *noun*
1 گـەورەیی، مـەزنی، مـەزناهی، شـکۆ، فـەر، ئەنـدێش، هەیبـەت، سـام، splendour: *the grandeur and simplicity of Roman architecture* 2 باوەڕ، بایەخ 3 دەس ڕۆیشتوویی، گرنگی ◌ 1 عظمت، شکوە 2 اعتبار 3 نفوذ

**grandfather** /'grænfɑ:ðə(r)/ *noun*
باپیرە، باوەگەورە، پیرک ◌ پدربزرگ

**grandfather clock** *noun*
کاتژمێری دیواری، سەعاتی لەنگەرەیی یان دیواری ◌ ساعت قدی

**grandiflora** /ˌgrandɪ'flɔ:rə/ *noun*
گوڵەگەورە ◌ گرانديفلورا

**grandiloquence** /ˌgrandɪ'flɔ:rəns/ *noun*
تەقوڕەقبوون، سەنگورەنگ، گرانی، سەختی ◌ طمطراق

**grandiloquent** /græn'dɪləkwənt/ *adjective*
(فـەرمـی و نابـەسـند) تـەقوڕەق، گـران، بەسەنگورەنگ، سەخت، pompous ◌ مطنطن

**grandiloquently** /græn'dɪləkwəntli/ *adverb*
بە شێوەیەکی تەقوڕەق ◌ بە طور مطنطن

**Grand Inquistor** *noun*
گەورەپـشکێنەر، سـەرپـشکێنەر، بەڕێوەبـەری دادگای پشکنین (ی بیروباوەڕ) ◌ مفتش اصلی در دادگاه تفتیش عقاید

**grandiose** /'grændiəʊs, US -oʊs/ *adjective*
(ب.ت. زۆرتـر بـۆ خۆنوانـدن) گـەورە، بەسـەنگورەنگ، مەزن، بەدەبدەبە، بەشکۆ: *a grandiose opera house* ◌ عظیم، شکوهمند

**grandiosely** /'grændiəʊsli, US -oʊs/ *adverb*
بەشکۆیانە ◌ بە طور مجلل

**grandiosity** /ˌgrændɪ'ɒsətɪ/ *noun*
گەورەیی، مەزنی، سەنگورەنگ، دەبدەبە، شکۆ، کەشخە ◌ عظمت، شکوە

**grand jury** *noun*
دەستەی سوێندخۆرانی باڵا ◌ هیأت منصفەی عالی

**grandma** /'grænmɑ:/ = grandmother

**grand mal** /ˌgrɒ̃ 'mæl, US ˌgræn 'mɑ:l, 'mæl/ *noun*
(فەرەنسی) گـەورەفێ، سەرفێ، فێی توند یان سەخت (بڕوانە petit mal) ◌ صرع شدید

**grandmama** = grandmother

**Grand Marnier** /ˌgrɒ̃ 'mɑ:nieɪ, US ˌgrɑ:n 'mɑ:rnjeɪ/ *noun*
(فەرەنـسی) گـرا مانیـە، گـران مارنیـە (خواردنەوەیەکی ئەلکولی توندە، لە براندی و پرتەقاڵ دروست دەبێ) ◌ گراند مارنیر

**Grand Master** *noun*
گەورە مامۆسـتا، مامۆسـتای مـەزن (ڕێبـەر یـان سەرۆکی کۆمەڵێکی فراماسۆنیری) ◌ استاد اعظم

**grand master** *noun*
قارەمانی شەترەنج، وەستای شەترەنج ◌ استاد شطرنج

**grandmother** /'grænmʌðə(r)/ *noun*
دایەگەورە، نەنک، دێباف (هی باوک)، پیرک، ماما ◌ مادربزرگ، بیبی

**grandmotherly** *adjective*
دایەگەورەئاسا ◌ مادربزرگوار

**Grand National** *noun*
پێشبڕکێی ئەسپسواری بە کۆسپی بەرزەوە ۞ مسابقەی اسب‌دوانی با مانع‌های بلند
**grand-nephew** /ˈgrænd nefju:/ *noun*
نەوەی برا یان خوشک (کە کوڕ بێ) ۞ نوەی برادر یا خواهر
**grand-nice** /ˈgrænd ni:s/ *noun*
نەوەی برا یان خوشک (کە کچ بێ) ۞ نوەی برادر یا خواهر
**grand opera** *noun*
گەورە ئۆپێرا، ئۆپێرای گەورە (تێکڕایان دەچڕن) ۞ اپرای سنگین
**grandpa** /ˈgrænpɑ:/ = grandfather
**grandpapa** = grandfather
**grandpappy** = North American grandfather
**grandparent** /ˈgrænpeərənt, US -perənt/ *noun*
گەورەباوان، پیرکان ۞ گراندپارنت، جدّ، جدّه
**grandparenthood** *noun*
گەورەباوانێتی ۞ گراندپارنتهود
**grand piano** *noun*
گەورەپیانۆ، پیانۆی گەورە ۞ پیانوی رویال
**Grand Prix** /ˌgrɑ̃: ˈpri:/ *noun*
(فەرەنسی) گرەندپری، یەکێ لەو چەند پێشبڕکێیە بۆ قارەمانێتی موتۆرسواری یان ماشێن‌لێخوڕی جیهانی ۞ گراندپری
**grandsire** /ˈgrænsaɪ(r)/ *noun*
(کۆن) باپیرە، باوەگەورە ۞ پدربزرگ
**grand slam** *noun*
گەورە سەرکەوتن، سەرکەوتنی گەورە یان مەزن ۞ پیروزی بزرگ
**grandson** /ˈgrænsʌn/ *noun*
نەوە (کوڕ) ۞ نوه
**grandstand** /ˈgrænstænd/ *noun*
جێگای تەماشاوانان، جێگای چاولێکەران ۞ جایگاه تماشاچیان
**grand total** *noun*
سەرجەم، تێکڕا ۞ جمع کل
**grand tour** *noun*
1 (جاران) سەردانی شارە سەرەکییەکانی ئەوروپا لە لایەن کەسانی دەوڵەمەندی بریتانیایی یان ئەمریکایی وەکوو بەشێ لە خوێندنەکەیان 2 سەردانی تەواو ۞ گراند تور
**grand-uncle** /ˈgrænd ʌŋkl/ *noun*
خاڵی باوک، خاڵی دایک، مامی باوک، مامی دایک ۞ دایی پدر، دایی مادر، عموی پدر، عموی مادر
**grandiflora** /ˌgrandɪˈflɔ:rə/ *noun, adjective*
1 ئاماژە بە چەندین جۆری ڕووەکی داچێنراوی گوڵ‌گەورە 2 گوڵەگەورە ۞ گراندیفلورا
**grange** /greɪndʒ/ *noun*
1 کۆشک‌وبەرە، خانەمووچە، ماڵی لادێیی 2 (کۆن) کێڵگە، مووچە 3 عەماری دەغڵ‌ودان، کادێن 4 (لە ئەمریکا) کۆمەڵەی پشتیوانی لە وەرزێران ۞ 1 گرانج، خانەی روستایی 2 مزرعە 3 انبار غلە، کاهدان 4 گرانج
**granger** *noun*
ئەندامی کۆمەڵەی پشتگیری جووتیاران ۞ گرانگر
**grangerism** /ˈgreɪndʒərɪzəm/ *noun*
ڕازاندنەوەی کتێب بە بڕینی وێنەی کتێبەکانی تر، بڕشتەچنی ۞ گرانگریسم
**grangerite** *noun*
کەسێ کە وێنەی کتێبەکانی تر لێدەکاتەوە و لەهی خۆی دەدا، بڕشتەچن ۞ گرانگریت
**graniferous** /graˈnɪf(ə)rəs/ *adjective*
(ڕووەکناسی، گیاکان) دانگر ۞ دانه‌آور
**graniform** *adjective*
دانەئاسا، شێوەدان، دانی ۞ دانه‌مانند
**granita** /graˈni:tə/ *noun, pl.* granite /-ˈni:teɪ/
ئەلاسکەی گڕنی‌گڕنی شێوەئیتالیایی ۞ گرانیتا
**granite** /ˈgrænɪt/ *noun*
گرانیت، بازار، بەردەبیرۆ ۞ سنگ خارا، گرانیت
**graniteware** /ˈgrænɪt weə(r)/ *noun*
1 گڵێنە یان ئاسنی بازارئاسا 2 هێربارێی میناکراو ۞ 1 سفالینە یا آهن خارامانند 2 ظروف آهنی لعاب‌دار
**granitic** /grəˈnɪtik/ *adjective*, also granitical
بازاری، گرانیتی ۞ وابستە بە سنگ خارا
**granitiform** *adjective*
بازاری، بازارئاسا، شێوەگرانیت ۞ خارامانند
**granivore** *noun*
گیانەوەری دانخۆر یان تووخۆر ۞ جانور دانه‌خوار
**granivorous** /graˈnɪv(ə)rəs/ *adjective*
(گیانەوەرناسی) دانخۆر، تووخۆر ۞ دانه‌خوار
**granny** /ˈgræni/ or grannie, *pl.* grannies = grandmother
**granny flat** *noun*
چەند دیوێ ب.ت. سەربە ماڵێ بۆ کەسێکی پیر ۞ گرانی فلات
**granny glasses** *noun, pl.*
شووشەی خڕی دەور یان چوارچێوەکانزایی ۞ گرانی گلاسس
**granny knot** *noun*
گرێ قوڵفە، گرێ شل ۞ گره خفت
**Granny Smith** *noun*
جۆرێ سێوی ترشی سەوزی دێسێر، هی ئەوسترالیا ۞ نوعی سیب
**granodiorite** /ˌgranə(ʊ)ˈdʌɪərʌɪt/ *noun*
جۆرێ بەردی گڕنی‌گڕنی یان دەنک‌دەنکی plutonic نێوان گرانیت و دایێرایت (یان دیۆریت

diorite) ۞ گرانودیوریت

**granodioritic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە گرانۆدایێرایتەوە هەیە ۞ وابسته به گرانودیوریت

**granola** /grəˈnəʊlə, US -ˈnoʊ-/ *noun*
گرانـۆلا (نـانی بـەیانی بـە کاکـڵە، دانەوێـڵە و دانەوە) ۞ گرانولا

**granolith** *noun*
جۆرێ بەرد کە لە گرانیتی وردوخاش و سیمان پێکهاتووە ۞ گرانولیت

**granolithic** *adjective*
سەربـە یـان پێوەنـدی بـە گرانۆلیتـەوە هـەیـە ۞ وابسته به گرانولیت

**granophyre** *noun*
جۆرێ بەردی گڕنی‌گڕنی یان دانەدانەی ئاگرینی ئەرخەوانەیی porphyritic زۆرتر لە فێلدسپار و کوارتز پێکهاتووە ۞ گرانوفیر

**granophyric** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە گرانۆفیری‌یەوە هەیە ۞ وابسته به گرانوفیر

**grant** /grɑːnt, US grænt/ *noun*
1 دەسـتـدە، پێـدان، بەخـشـین 2 بـورس 3 (بـە مەبەستێکی تایبەتی) یارمەتی حکومەتی، یارمەتی بێ‌دانەوە یـان پێـاوەتی‌یانە، یارمەتی، کۆمـەک، پێتـاک 4 (زەوی‌وزار) بـەنێوکردن ۞ 1 اعطـا 2 کمک هزینه 3 اعانه، کمک بلاعوض 4 واگذاری

**grantable** /ˈgrɑːntəbl/ *adjective*
لەپێدان‌هاتوو، شیاوی بەخـشـین، دەبەخـشـرێ ۞ قابل اعطا

**grant aid** *noun*
یارمـەتی‌پێـدان (یارمـەتی دارایـی کـە لـە لایـەن حکومەتی ناوەندی‌یەوە بۆ حکومەتی خـۆجێیی یان دەزگایێ) ۞ اعانه، گرانت آید

**grant-aided** *adjective*
یارمـەتی‌پێـدراو، کـە لـە حکومـەت یارمـەتی وەردەگرێ ۞ گرانت آیدید

**granted** /ˈgrɑːntɪd, US ˈgræn-/ *adverb*
دروستە، راستە، وایە، زۆر باشە، admittedly: *'You could have done more to help.' 'Granted.* ۞ قبول که، صحیح

**grantee** /grɑːnˈtiː/ *noun*
1 پێدراو، پێشکەشی‌گر، دیاری‌گر، پێ‌بەخـشراو، دیاری‌پێدراو 2 بەنێووکراو، بۆ راگوێزراو ۞ 1 عطیه‌گیر 2 انتقال‌گیرنده

**grant-in-aid** *noun, pl.* grants-in-aid
یارمەتی، پێتاک، کۆمەک (دەدرێ بـە حکومـەتی خۆجێیی، دەزگایێ یان خوێندنگایێکی تایبەتی): *I was awarded a grant-in-aid to conduct my research* ۞ اعانه

**grant-maintained** *adjective*
(لە بریتانیـا) خوێنـدنگایێ کـە راستـەوخۆ پـارەی خۆی لـە حکومـەتی ناوەنـدی وەردەگرێ هـەتا حکومەتی خۆجێیی، میری ۞ گرانت مین‌تیند

**grantor** *noun*
1 پێدەر، پێ‌بـەخـش 2 بەنێوکـەر، راگـوێزەر ۞ 1 واهب، بخشنده 2 واگذارکننده

**Grant's gazelle** *noun*
جۆرێ ئاسکی قاوەیی شـاخ‌درێژی رۆژهـەڵاتی ئـەفریکـا، لـە سـوودان و ئـەتیۆپیـاوە تـا کینیـا و یوگاندا دەبینرێ [*Gazella granti*] ۞ نـوعی آهو

**gran turismo** /ˌgran tʊˈrɪzməʊ/ *noun*
گـران توریزمـۆ (مـۆدێلێکی ماشـێن) ۞ گـران توریزمو

**granular** /ˈgrænjələ(r)/ *adjective*, also granulous or granulary
1 دەنکەدەنکـە، دانەدانـە، داناردانـار، دان‌دان، دەنکەجۆیی، دەنکـ‌دەنک، پێکهاتوو لـە دەنـک یـان دەنکۆڵـەی ورد، grainy 2 زبـر، درشـت، گڕنی‌گڕنی، گرنج‌گرنج ۞ 1 دانه‌دانه 2 زبر

**granularity** *noun*
دەنکـەدەنکی، دانەدانـەیی، داناردانـاری، دانـاریتی ۞ حالت دانه‌دانه

**granularly** *adverb*
دەنکەدەنکانە، بە شێوەی دەنکـ‌دەنک ۞ به طور دانه‌دانه

**granulated** *adjective*
دەنکەدەنکـە، دانەدانـە، دان‌دان، دەنکـەجۆیی، دەنکـ‌دەنک ۞ دانه‌دانه

**granulated sugar** /ˌgrænjuleɪtɪd ˈʃʊgə(r)/ *noun*
شـەکر، شـەکری زبـرە یـان درشـت، شـەکری دەنک‌زل ۞ شکر دانه‌درشت

**granulation** /ˌgrænjəˈleɪʃn/ *noun*
1 دەنـکـ‌دەنـکـ‌بـوون، بـەدەنـکـ‌بـوون 2 گۆشـتـەزوون(هێنـان)، سـارێژبوونەوە، خووزهێنانەوە ۞ 1 دانه‌شدگی 2 التیام یافتن زخم

**granulation tissue** *noun*
1 شانەی سارێژەوەبوو 2 گۆشتەزوون، گۆشتی تازە ۞ 1 بافت التیامی 2 گوشت نو

**granule** /ˈgrænjuːl/ *noun*
دەنـک، دانـە، دەنکۆڵـە: *instant coffee granules* (بنەڕەت: لە *granulum* late Latin، چکۆلێنراوی *granum* "دان، دانە grain") ۞ دانه

**granuliferous** /grænjʊˈlɪfərəs/ *adjective*
دانگر، داناوی، پڕدان ۞ دانه‌آور

**granuliform** /grænjʊlɪfɔːm/ *adjective*
دەنک‌ئاسا، شێوەدەنک، دەنکی ۞ دانه‌مانند

**granulite** *noun*
(زەوی‌ناسـی) گرانۆلیـت (جـۆرێ بـەردی تێکچـووی metamorphic دەنـکـ‌ورد زۆری کوارتز و فێلدسپار تیایە) ۞ گرانولیت

**granulitic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە گرانولیتەوە هەیە ۞ وابستە بە گرانولیت

**granulocyte** /'granjʊlə(ʊ)ˌsʌɪt/ *noun*
(کارئەندامناسی) خانەدەنکۆلە: خرۆکەیێ سپی کە لەنێو سایتوپلازمەکەیدا دەنکی دەردەری هەیە ۞ گرانولوسیت

**granulocytic** *adjective*
خانەدەنکۆلەیی، سەربە گرانولوسایت ۞ وابستە بە گرانولوسیت

**granulocytopoiesis** *noun*
پێکهاتنی گرانولوسایتە خوێنی‌یەکان ب.ت. لە (نێو) مۆخی ئێسکدا bone marrow ۞ گرانولوسیتوپویسس

**granuloma** /ˌgranjʊ'ləʊmə/ *noun, pl.* granulomas or granulomata /-mətə/
(پزشکی) توپەڵەیێکی بەستەرەشانەی دەنکەدەنکە، بە تایبەت لە ئەنجامی کاردانەوەی نەخۆشی، ئاوسان و یان ماک و مەتریالێکی دەرەکی یان بێگانەوە بەرهەم هاتووە؛ لوو یان تومۆرێ کە لە ئەنجامی granulation tissue پێکهاتووە ۞ گرانولوما

**granulose** = granular

**granum** *noun, pl.* grana
1 = grain 2 یەکێ لە یەکە پێکهاتەیی‌یەکانی کلۆرۆپلاستێکی نێو رووەکە ئاوخۆرەیی‌یەکان vascular plants، لە کۆمەڵە تویێکی thylakoid ـەکان پێکهاتووە ۞ گرانوم

**grape** /greɪp/ *noun*
1 ترێ، هەنگوور، دەنکەترێ، گلارە 2 رەنگی سووری ئامالشین، ئەرخەوانی تۆخ 3 بۆمبی هێشوویی 4 (the grape) مەی ۞ 1 انگور، دانەی انگور 2 قرمز متمایل بە آبی 3 بمب خوشەای 4 (با the) شراب

**grapefruit** /'greɪpfru:t/ *noun, pl.* same
لیمۆی بەهەشتی، گرێپفروت [ *Citrus paradisi*] ۞ توسرخ

**grape hyacinth** *noun*
سملەترێ؟: جۆرێ گیای چکۆلانە لە تیرەی lily، بە هێشووی گوڵی خڕی شینی چکۆلەوە [توخم *Muscari*] ۞ کلاغک

**grape-hopper** /greɪp hɒpə(r)/ *noun, US*
مێشوولەی ترێ یان مێو ۞ شتەی مو

**grape-house** /greɪp haʊs/ = vinery

**grape ivy** *noun*
جۆرێ رەز یا ترێی پیاهەڵچوو یان تەرزفرێدەری هەمیشەسەوز، وەک رووەکی ماڵێ وایە [ *Cissus rhombifolia* و جۆرەکانی تر] ۞ نوعی تاک

**grape-louse** /greɪp laʊs/ *noun*
مێشوولەی ترێ یان مێو ۞ شتەی مو

**grapeseed oil** *noun*
رۆنی دەنکی ترێ ۞ روغن دانەی انگور

**grapeshot** /'greɪpʃɒt, US -ʃɑ:t/ *noun*
بۆمبی هێشوویی ۞ بمب خوشەای

**grape-stone** /greɪp stəʊn/ *noun*
ناوک یان دەنکی ترێ ۞ دانەی انگور

**grape-sugar** *noun*
شەکری ترێ ۞ گلوکز

**grapevine** /'greɪpvaɪn/ *noun*
1 دارمێو، دارترێ [*Vitis vinifera* و جۆرە پێوەندی‌دارەکان] 2 (the grapevine)، نافەرمی) سوورانەوە یان گەریانی قسەلۆک و زانیاری نافەرمی ۞ 1 تاک 2 گریپوین

**grapewort** *noun*
(رووەکناسی) مێوەمارانە، ترێمارانە ۞ فاشرا

**graph**[1] /græf, US grɑ:f/ *noun*
هێڵکاری، گراف، چەماوە ۞ نمودار، منحنی

**graph**[2] /græf, US grɑ:f/ *noun*
(زمانەوانی) نووسە(ک)، گراف ۞ گراف

**-graph** *suffix*
پاشگر: ـنووس، ـنیس، ـگراف، ئاماژە بە دەزگا یان ئامێرێ کە کاری تۆمار دەکا: *seismograph*، *chronograph* نووسەراو، کێشراو، شتێکی نووسراو یان کێشراو: *monograph*، *autograph* (بنەرەت: لە - *graphe* فەرەنسی، لەسەر بنچینەی *graphos* یۆنانی "written, writing") ۞ پسوند: نگار، نویس، نوشته‌شده، نقاشی‌شده

**grapheme** /'græfi:m/ *noun*
(زمانەوانی) گرەفیم، نووسە، گرافیم (چکۆلەترین یەکەی واتاداری سیستمی نووسین) ۞ نویسە

**graphemic** *adjective*
سەربە گرەفیم، گرافیمی، پێوەندی بە گرافیمەوە هەیە ۞ وابستە بە نویسە، نویسەای

**graphemically** *adverb*
لەباری گرافیمی‌یەوە ۞ از لحاظ نویسەای

**-grapher** *suffix*
پاشگر، گرافێر، ـنووس (بنەرەت: لە *-graphos* یۆنانی "writer") ۞ پسوند: نگار

**graphic** /'græfɪk/ *adjective*
1 گرافیک، هێڵکاری‌یانە 2 (خوازە) ئاشکرا، رۆشن، دووروودرێژ، چڕوپڕ، بێ‌پەردە، پەروەردەکاری ۞ 1 ترسیمی، نموداری 2 واضح، مشروح

**-graphic(al)-** /'græfɪk(l)/ *suffix*
پاشگر: ئاوەڵناو دروس دەکا ۞ پسوند: صفت‌ساز

**graphicacy** /'grafɪkəsi/ *noun*
توانایی تێگەیشتنی نەخشە و گرافەکان ۞ گرافیکاسی

**graphical** /'græfɪkl/ *adjective*
1 سەربە یان لە شێوەی گراف: *The system uses an impressive graphical interface* 2

به شێوەی گراف یان دیاگرام: **a graphical** *presentation of results* ۞ 1 وابسته یا به شکل گراف 2 به شکل نمودار

**graphically** /'græfɪkli/ *adverb*

به روونی، به ئاشکرایی ۞ به طور واضح

**graphic artist** *noun*

گرافیست ۞ طراح

**graphic arts** *noun, pl.*

هونەرە گرافیکییەکان ۞ هنرهای گرافیک

**graphic user interface** *noun,* also GUI

جی‌یوئای (شێوەیەکی پیشاندان و ڕێکخستنی زانیاری لەسەر پەردەی کامپیوتێر کە ئاسانە بۆ بەکارهێنان و تێگەیشتن) ۞ جی‌یوآی

**graphic design** *noun*

دیزانی گرافیکی (هونەری تێکەڵکردنی وێنەکان، وشەکان و ڕازاندنەوە و بەرهەمهێنانی کتێب، کۆڤار و هتد) ۞ طراحی گرافیکی

**graphic designer** *noun*

دیزاینێری گرافیکی ۞ طراح گرافیکی

**graphics** /'græfɪks/ *noun, pl.*

1 هونەری کێشانەوە 2 کار یان بەرهەمە گرافیکییەکان 3 وێنەکێشی (ب.ت. بۆ بەرهەمهێنانی کتێب، کۆڤار و هتد) ۞ 1 رسم فنی 2 آثار گرافیکی 3 طراحی

**graphics card** *noun,* also **graphics adapter**

(کامپیوتێر) کارتی گرافیکی ۞ کارت گرافیکی

**graphite** /'græfaɪt/ *noun*

سورب یان قورقوشمی ڕەش، نێوی پێنووس، گرافیت ۞ گرافیت

**graphitic** /grə'fɪtɪk/ *noun*

سەربە قورقوشمی ڕەش، گرافیتی ۞ گرافیتی

**graphitization** *noun*

گرافیتی‌کردن، گرافیتاندن ۞ گرافیتی‌کردن

**grapho-** *prefix*

پێشگر: نووسین: *grapholect* (بنەڕەت: لە فەرەنسی نێوەڕاست، لە *graphē* یونانی "writing"، لە *graphein* "نووسین" to write") ۞ پیشوند: نگارش

**grapholect** *noun*

زاراوی ستانداری یان پێوانەیی نووسین ۞ گرافولکت

**grapholite** /'græfəlaɪt/ *noun*

تاشەبەردێ بۆ نووسین، بەردەنووس ۞ گرافولیت

**graphological** *adjective*

سەربە هێڵناسی یا خەتناس یا نووسراوەناسی، دەسنووس‌ناسی‌یانە ۞ خط‌شناختی

**graphologist** *noun*

هێڵناس، خەتناس، دەسنووسناس، نووسراوەناس ۞ خط‌شناس

**graphology** /græ'fɒlədʒi, US -'fɑ:l-/ *noun*

1 هێڵناسی، خەتناسی، دەسنووس‌ناسی، نووسراوەناسی (لێکۆڵینەوەی دەسنووس و هێڵەکان بە مەبەستی ناسینی کەسایەتی نووسەرەکەی) 2 (زمانەوانی) لێکۆڵینەوەی هێما نووسراوە یان چاپکراوەکان یان سەربە سیستەمە نووسراوەکان ۞ 1 خط‌شناسی 2 گرافولوژی

**graph paper** *noun*

کاغزی شەترەنجی، کاغزی خانەخانە، کاغزی گراف ۞ کاغذ میلی‌متری

**-graphy** *suffix*

پاشگر: نووسی، نووسین (لەبارەی شتێکی تایبەتەوە)، شتێکی نووسراو یان کێشراو: *hagiography*، *monograph* جۆرێکی هونەر یان زانست، زانستی باسکردی یا دیسکرایپتیڤ: *geography* شێواز یان شێوەیێکی نووسین یا کێشانەوە: *calligraphy*؛ تکنیک یا شێوەی بەرهەمهێنان یان هەڵگرتنەوەی وێنەکان: *radiography*؛ لیستی نووسراو یان چاپکراو: *filmography* (وێنەکێشی؛ بنەڕەت: لە *graphia* یونانی "writing") ۞ پسوند: نگاری، نوعی هنر یا علم، علم توصیفی، شکلی از نگارش یا نقاشی؛ گرافی

**grapnel** /'græpn(ə)l/ *noun*

1 ئامرازێکی قولاپی یان چنگاڵی بۆ ڕاگرتنی کەشتی دوژمن بە مەبەستی پیاهەڵچوون بۆسەر تەختی کەشتی‌یەکە 2 لەنگەری چەنلقە، لەنگەری قولاپی، قولاپ، چنگ(گ)ڕە، قەلانگ، قەلاگ، لەنگەرۆکە، لەنگەرچە ۞ 1 گراپنر 2 چنگک، لنگرچە

**grappa** /'græpə/ *noun*

گراپا (خواردنەوەیەکی ئیتالیایی‌یە) ۞ گراپا

**grapple** /'græpl/ *noun*

1 ئامبازبوون، ئاوقەبوون، پەرپیاکردن 2 قولاپ، قەلانگ ۞ 1 گلاویزی 2 چنگک

**grappling iron** /'græplɪŋ aɪən/ *noun,* also **grappling hook**

لەنگەری چەنلقە یان لقولق، لەنگەری قولاپی، قولاپ، چنگرە، قەلانگ، قەلاگ ۞ گراپنر، چنگک

**graptolite** /'græptəlʌɪt/ *noun*

فوسیل یان بووبەردی گیانەوەری بڕبڕەداری سەراوەکی ۞ گراپتولیت

**grasp** /grɑ:sp, US græsp/ *noun*

1 گرتن، گیرلێ‌هێنان، گیر، چنگ‌لێ‌گیرکردن: 2 *She felt a firm grasp on her arm* چنگ، مشت 3 دەسەلات، کۆنترۆل، زاڵی، hold، control 4 پێ‌بردن، تێگەیشتن، سەرلێ‌دەرکردن، سەرەندەرکردن، پێ‌زانین: *These complex formulae are beyond the grasp of the average pupil* 5 دەس‌پێ‌ڕاگەیشتن ۞ 1 گیرش 2 چنگ 3 embrace ؛handle = 6 قدرت، تسلط 4 ادراک 5 دسترسی

**grasping** /'grɑːspɪŋ, US 'græs-/ *adjective*
مـــال‌پەرســـت، بەتـــەماح، چاونەزێـــڕ، رژد، پارەپەرست ۞ حريص، آزمند

**graspingly** /'grɑːspɪŋli, US 'græs-/ *adverb*
ماڵپەرستانە ۞ حريصانە

**grass** /grɑːs, US græs/ *noun*
1 گیا، چیمەن، سەوزەگیا، چیم، بژوێن، زەمەن، چرگ، چەولیک، جێ‌لەوەڕ، مێرگ، گیاجاڕ 2 (نافەرمی) مەریوانە، ماریجوانا 3 (نافەرمی و بریتانیا) سیخوڕ، راپۆرتچی 4 گەنمیان، گیا یان رووەکی دانگر ۞ 1 علـف، چمـن، چراگـاه، علف‌زار 2 ماری‌جوآنا 3 خبرچین 4 گراس

**grassbird** *noun*
گیابالندە؟: جۆرێ warbler ی ڕیزیی قاوەیی، لەنێو قامیشەڵان و بەرزەگیادا زۆر دەبینرێ [توخم *Megalurus* (ئەوستراڵاسیا و ئاسیا) و *Sphenoeacus afer* (باشووری ئەفریکا)] ۞ گراس‌برد

**grassbox** *noun*
جێ‌گیا، گیادان، جێگایێ لە دەزگای دوورینی گیا کە گیای براوی تیا کۆدەبێتەوە ۞ گراس‌باکس

**grass carp** *noun*
جۆرێ ماسی زلەی چینی ئاوی شیرین، هی باشـووری خۆرهـەڵاتی ئاسـیا، بـۆ خـۆراک پەروەردە دەکرێ [*Ctenopharyngodon idella*] ۞ نوعی ماهی

**grass court** *noun*
یاریگای تێنیس ۞ زمین بازی

**grassed** /grɑːst, US græst/ *adjective*
بەگژوگیا داپۆشراو، بژوێناوی، چیماوی، پڕگیا ۞ پوشیده از علف

**grass-green** /'grɑːs 'griːn/ *noun*
رەنگـی سـەوزی سـەیدی، سـەوزی گیـایی، خەیاری ۞ سبز چمنی

**grasshopper** /'grɑːshɒpə(r), US 'græshɑːp-/ *noun*
کوللـە، کولـە، ملـۆ [خێـزان Acrididae: زۆر جۆرن] ۞ ملخ

**grasshopper warbler** *noun*
واربلێـری کـوللەیـی [*Locustella naevia* و جۆرەکانی تر] ۞ نوعی پرنده

**grassland** /'grɑːslænd, US 'græs-/ *noun, pl.* grasslands
لەوەڕ، جێ‌لەوەڕ، لەوەڕجاڕ، ئالفجاڕ، ئاران، چـرگ، چرگـەن، چێـری، گیاجـاڕ، بـژوێن، سەوزایی، سەوزەڵان ۞ مرتع، چراگاه

**grasslike** /'grɑːslaɪk/ *adjective*
گیائاسا، شێوەگیا ۞ علف‌مانند

**grass of Parnassus** *noun*
جۆرێ گیـای بـاکووری مێرگـەڵانە زنەکـان، بـە گوڵـێکی سـپی تاقـەوە [*Parnassia palustris*] ۞ نوعی گیاه

**grass parakeet** *noun*
(ئەوستراڵیا) تووتی ناوگیا یان شـیناوەرد، تـووتی مێرگـــــــــەڵان [*Neophema Psephotus* و توخمەکانی تر] ۞ نوعی طوطی

**grass pea** *noun*
نۆکەگیا؟، گیانۆک؟: گیایێکی دانەویلەیی، وەک خـۆراک یـان تفـاق بـۆ مـڕۆ و پاتـاڵ دەکـرێ [*Lathyrus sativus*] ۞ نوعی گیاه

**grass plot** /'grɑːs plɒt/ *noun*
مێرگ، شیناوەرد ۞ چمن

**grassquit** /'grɑːskwɪt/ *noun*
جـۆرێ باڵـندەی دەنـگ‌خۆشـی کـارائیبی و گەرمێنانی ئەمریکا، پێوەندی بە bunting ـەکانەوە هەیە [*Tiaris* و توخمەکانی تر] ۞ گراس‌کویت

**grass roots** *noun, pl.* often the grass roots
خەڵـکی رەمـەکی، خەڵـکی ئاسـایی، جـەماوەر: *the grass roots of the party* ۞ مردم عادی

**grass sickness** *noun*
نـەخۆشی گیـا: ئـەسپەکـان تووشـی دێـن و لـە ڕیخۆڵـــەوە دەیگـــرن و زۆرجـــار دەبێتـــە نەخۆشی‌یێکی کوشندە ۞ گراس سیکنس

**grass ski** *noun*
سکی سەرگیا، گیاخلیسکێ ۞ گراس اسکی

**grass skirt** *noun*
کراسی گیایی، گیاکراس: لە گیا و گەڵای درێژ ساز دەکرێ و سەماکاری ژنی هێندێ دوورگەی پاسیفیک لەبەری دەکەن ۞ گراس اسکیرت

**grass snake** *noun*
(گیانەوەرناسی) 1 سەوزەمار [*Natrix natrix*] 2 وشـەیێکی ئـەمریکای بـاکووری بـۆ green snake ۞ مار حلقه‌دار

**grass tree** = blackboy

**grass widow** *noun*
1 بێوەژنی چەند رۆژە (ژنێ کە مێردەکەی بۆ چـەن رۆژێ دوورە) 2 ژنی تـەڵاق‌دراو ۞ 1 بیوه‌ی چند روزه 2 زن مطلقه

**grass widower** *noun*
پیاوی بێوە، پیاوێ کە لە ژنەکەی جیابۆتەوە ۞ مرد بیوه

**grassy** /'grɑːsi, US 'græsi/ *adjective* (grassier, grassiest)
داپۆشـراو بـە گیـا، سـەوز، پـڕگیا، سـەوزەڵانی، بژوێناوی، شیناوەرد، گیاجاڕ: *a grassy bank* ◊ *grassy lawns* ۞ پرعلف

**grate** /greɪt/ *noun*
1 (کولین) ئاورگ، ئاگردان، مەنقەڵ، ناوگۆڕک، کوورە، کوورەی دیواری 2 رەندە، کوشتەرا 3 تۆڕ، پـەنجێرە 4 زینـدان، بەندیخانـە 5 دەنگی لێک‌کەوتن، زرنگەزرنگ (شمشێر و هتد) ۞ 1

آتشدان، منقل 2 رنده 3 شبکه، پنجره 4 زندان 5 صدای برخورد

**grateful** /'greɪtfl/ *adjective*
1 سپاس‌کار، سپاس‌بێژ، سپاس‌بژێر، منه‌ت‌بار، منه‌ت‌دار، بەسەفەت، باوەفا، نمەک‌ناس، مەمنوون 2 خۆش (بنەڕەت: لە grate ی بێ‌باو - + لاتین gratus (لە "thankful ,pleasing" ful) ◊ 1 متشکر، سپاس‌گزار 2 مطبوع

**gratefully** /'greɪtfəli/ *adverb*
بە سپاسەوە، سپاس‌کارانە: *He nodded gratefully* ◊ با سپاس‌گزاری

**gratefulness** *noun*
سپاس‌کاری، سپاس‌بێژی، سپاس‌بژێری، منەت‌باری ◊ سپاس‌گزاری

**grater** /'greɪtə(r)/ *noun*
رەندە، رەننە، کوشتەرا: *a cheese/nutmeg grater* ◊ رنده

**graticule** /'grætɪkju:l/ *noun*
تۆڕی هێڵەکان (سەر نەخشە یان پلانێ) ◊ شبکه‌ی خطوط

**gratification** /ˌgrætɪfɪ'keɪʃn/ *noun*
پێ‌خۆشبوون، قایلی، ڕازی‌بوون، خۆشی، لەزەت ◊ خشنودی، لذت

**gratified** *adjective*
قایل، ڕازی، پێ‌خۆشبوو ◊ خشنود

**gratifying** /'grætɪfaɪɪŋ/ *adjective*
خۆشحاڵ‌کەر، قایلکەر، مایەی پێ‌خۆشبوون، مایەی خۆشی، *a gratifying result* :pleasing ◊ *He felt a gratifying sense of being respected and appreciated* ◊ مسرت‌بخش، ارضاکننده، مطلوب

**gratifyingly** /'grætɪfaɪɪŋli/ *adverb*
قایلکەرانە: *This year, gratifyingly, we have made a small profit* ◊ به طور مسرت‌بخش

**gratin** /'grætæn, US 'grætn/ *adjective*
1 جۆری چێشت 2 upper crust: *the gratin of London society* ◊ گرتن

**grating**[1] /'greɪtɪŋ/ *adjective*
ناخۆش، قیزە و هەرای ناخۆش، کەڕکەر: *The sound of his -ating voice complaining all day was driving me crazy* ◊ گوش‌خراش

**grating**[2] /'greɪtɪŋ/ *noun*
1 نەردە، میل 2 تۆڕ 3 پەنجێرە 4 چوارچێوەی ئاسنی یان میلی تۆڕی ◊ 1 نرده 2 شبکه 3 پنجره 4 چهارچوب آهنی

**gratis** /'grætɪs, US 'greɪtɪs/ *adjective, adverb*
مفت، خۆڕایی، بەلاش، بێ‌مز ◊ رایگان

**gratitude** /'grætɪtju:d, US -tu:d/ *noun*
سپاس، ڕێزلێنان، پێزانین، قەدرزانی، پێزانی، ئەمەک‌ناسی، حورمەت بۆدانان: *He smiled at them with -atitude* ◊ سپاس، تشکر، قدردانی

**gratuitous** /grə'tju:ɪtəs, US -'tu:-/ *adjective*
1 لەخۆوە، هەڕەمەکی، لەخۆڕایی، بێ‌هۆ، بێجێ: *gratuitous violence on television* 2 خۆڕایی، مفت، بەلاش ◊ 1 بی‌دلیل، بی‌جهت 2 رایگان

**gratuitously** /grə'tju:ɪtəsli, US -'tu:-/ *adverb*
لەخۆوە، لەخۆڕایی، بە خۆڕایی: *The film was gratuitously offensive* ◊ بی‌جهت، مجاناً

**gratuitousness** /grə'tju:ɪtəsnəs, US -'tu:- / *noun*
1 لەخۆوەبوون، لەخۆڕاییبوون 2 بەلاشی، خۆڕاییبوون ◊ 1 بی‌جهت بودن 2 مجانی‌بودن

**gratuity** /grə'tju:əti, US -'tu:-/ *noun, pl.* gratuities
1 دەس‌خۆشانە، دەسمەڕیزانە، شاگردانە، کاڵەدڕانە: *Our staff may not accept gratuities* 2 پاداشی خانەنشینی ◊ 1 انعام 2 پاداش بازنشستگی

**gratulation** *noun*
پیرۆزبایی ◊ تبریک

**gratulatory** /'grætʃəleɪtəri/ *adjective*
پیرۆزبایی‌یانە ◊ تبریک‌آمیز

**graupel** *noun*
تۆپەڵەبەفر ◊ گلوله‌ی برف

**Graustark** *noun*
وڵاتی خەیاڵی، چیرۆک یان داستانی خەیاڵی، پارچە نووسراوەیێکی یەکجار ڕۆمانتیک (Graustarkian *adj*، بنەڕەت: لە ناوی ڕۆمانی *Graustark* ڕۆمان‌نووسی ئەمریکایی George Barr McCutcheon (1866–1928) ◊ سرزمین یا داستان خیالی، قطعه نوشته‌ی بسیار رمانتیک

**gravadlax** /'gravədˌlaks/ = gravlax

**gravamen** /grə'veɪmen/ *noun, pl.* gravamina /-mɪnə/
1 (ماف) کرۆک یان بەشی بنەڕەتی شکات یان تاوانبارییێ 2 بەشی بنەڕەتی ◊ 1 اصل شکایت یا اتهام 2 قسمت اصلی

**grave**[1] /greɪv/ *noun*
گۆڕ، قەبر، مردن، مەرگ: *There were flowers on the grave* ◊ گور، مرگ

**grave**[2] /greɪv/ *adjective* (graver, gravest)
1 سەخت، پڕمەترسی، کەسکوون، خراپ، بەسام: *We were in grave danger* 2 قورس، سەنگین 3 گەورە، گرنگ 4 (هەڵس‌وکەوت) بەڕشت، مەند ◊ 1 وخیم، شدید 2 موقر 3 مهم 4 جدی

**grave**[3] /gra:v/ *noun*
نیشانەی (`) کە لەسەر بزوێنێ دادەنرێ تا ئاماژە بەوە بکا کە چۆن گۆ دەکرێ (وەکوو *père*

فەڕنسی) ۞ گراو

**grave accent** = grave3

**graveclothes** *noun, pl.*

خەلاتی، کفن، بەرگەمەرگ ۞ کفن

**gravedigger** /ˈgreɪvdɪgə(r)/ *noun*

گۆڕهەڵکەن، گۆڕکەن ۞ گورکن

**gravel** /ˈgrævl/ *noun*

1 زیخ، خیز، چەو، وردەبەرد، ورکەبەرد 2 (گورچیلە و میزەڵدان) بەرد ۞ 1 شن، سنگریزه 2 (کلیه و مثانه) سنگ

**graveless** *adjective*

بێقەبر، بێ گۆڕ ۞ بی‌قبر

**gravelled** /ˈgrævld/ *adjective*

چەوڕێژ، زیخڕێژ (کراو) ۞ شنی

**gravelly** /ˈgrævəli/ *adjective*

1 چەوڕێژ، زیخڕێژ (کراو)، چەوار، پڕچەو، پڕزیخ، زیخاوی 2 (دەنگ) گڕ، ناقوڵا ۞ 1 شنی، پرریگ 2 (صدا) خشن

**gravelly-pit** *noun*

قوڵکەزیخ، چەودان، چاڵەزیخ ۞ گودەی شن

**gravelly soil** *noun*

زەوی زیخاوی، خۆڵی زیخاوی، گڵی چەودار ۞ خاک شنی

**gravelly-stone** *noun*

ورکەبەرد، زیخ ۞ سنگریزه

**gravel path** *noun*

ڕێگای زیخڕێژ، ڕێگای زیخەلان، زیخەڕێ ۞ جادەی شنی

**gravel-walk** *noun*

(ڕێگا) بەردڕێژ ۞ سنگ‌فرش

**gravely** /ˈgreɪvli/ *adverb*

بە سەختی، بە توندی، سەخت، زۆر خراپ یا شپرزە: *Local people* ◊ *She is gravely ill* ۞ *are gravely concerned* به شدت، بدجوری

**graven** /ˈgrævəli/ *adjective*

هەڵکەنراو، هەڵکۆڵراو، داتاشراو ۞ حک‌شده

**graven image** /ˌgreɪvn ˈɪmɪdʒ/ *noun*

(کتێبی پیرۆز) بت ۞ صنم

**graver** *noun*

1 (کۆن) کۆڵیار، هەڵکۆڵ، نەخشکەن، کەندەکار 2 گالیسک، قەڵەمە (یان ئامرازێکی تری)ی هەڵکەندن burin ۞ 1 حکاک 2 قلم حکاکی

**Graves** /grɑːv, French gRav/ *noun*

مەیێکی سوور یان سپی Graves (ناوچەیێ لە باشووری ڕۆژاوای فەڕەنسە) ۞ گرافس

**Grave's disease** *noun*, also exophthalamic goitre

ماسینی مل و دەرپەڕینی چاو لە ئەنجامی پڕکاری ڕژێنەی تیرۆئید (بنەڕەت: لە ناوی پزشکی ئیرلەندی *Graves* .Robert J) ۞

بیماری گراوس

**graveside** *noun*

لای گۆڕ، تەنیشت قەبر، پاڵ گۆڕ ۞ کنار قبر

**gravestone** /ˈgreɪvstəʊn, US -stoʊn/ *noun*

کێل، هەنگێز، بەردی گۆڕ، میل ۞ سنگ قبر

**Gravettian** /grəˈvetɪən/ *adjective*

(شوێنەوارناسی) سەربە چاندی بەردینی کۆنی پاشتر لە ئەورووپا کە Aurignacian ی بەدوادا دێ، دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری 28,000-19,000 ساڵ لەمەو پێش (بنەڕەت: لە *la Gravette* ەوە لە باشووری ڕۆژاوای فەڕەنسە، جێیێ کە شوێنەواری ئەو چاندەی لێدۆزراوە) ۞ گراوتین

**graveyard** /ˈgreɪvjɑːd, US -jɑːrd/ *noun*, also cemetery

گۆڕستان، قەبران، قەبرستان، شاری خامۆشان (لەپاڵ کلێسەیێک) ۞ گورستان، مدفن

**gravi-** *prefix*

پێشگر: قورس، بەکێش، گران ۞ پیشوند: سنگین

**gravid** /ˈgrævɪd/ *adjective*

1 سکپڕ، دووگیان، ئاوس 2 قورس، گران، دژوار ۞ 1 آبستن 2 سنگین

**gravimeter** /grəˈvɪmɪtə/ *noun*

ڕاکێشانپێو (بنەڕەت: لە *gravimètre* فەڕەنسییەوە، لە *grave* "قورس" + *-mètre* "پێو(ان)") ۞ جاذبه‌سنج

**gravimetric** *adjective*

سەربە ڕاکێشانپێوی ۞ وابسته به جاذبه‌سنجی

**gravimetry** /grəˈvɪmɪtri/ *noun*

ڕاکێشانپێوی ۞ جاذبه‌سنجی

**graving dock** *noun*

گۆلاوی وشک، حەوزی وشک، کەشتیگەی وشک (بۆ خاوێنکردنەوەی لاشەی دەرەوەی کەشتی) ۞ حوض خشک

**gravitas** /ˈgrævɪtas, US -tɑːs/ *noun*

قورسی، مەندی، سەنگینی، گەورەیی، شەوکەت، سام: *a book of extraordinary gravitas* (بنەڕەت: لاتین، لە *gravis* "serious") ۞ وقار، متانت، عظمت

**gravitation** /ˌgrævɪˈteɪʃn/ *noun*

1 (تەکنیکی، هێزی) ڕاکێشان، ڕاکێشکردن 2 ڕاکێشان، کێشکردن ۞ 1 گرانش، جاذبه 2 جلب

**gravitational** /ˌgrævɪˈteɪʃənl/ *adjective*

سەربە ڕاکێشان، ڕاکێشەرانە: *the gravitaional pull of the moon* ۞ گرانشی

**gravitational constant** *noun*

جێگیری ڕاکێشان یان ڕاکێشەرانە (قانوونی نیوتۆن، بەرامبەر بە $6.67 \times 10^{-11}$ N $m^2$ $kg^{-2}$) ۞ ثابت گرانشی

**gravitational field** *noun*

مەیدان یان بواری ڕاکێشان ۞ میدان جاذبه
**gravitational pull** *noun*
هێزی ڕاکێشان ۞ نیروی گرانشی
**graviton** /ˈgrævɪtɒn/ *noun*
(فیزیک) گرافیتۆن: پارچۆلکەیێکی وادانراو یان خەیاڵی کە بری وزەی ڕاکێشان دەخاتەڕوو ۞ گراویتون
**gravity** /ˈgrævəti/ *noun, pl.* gravities
1 قورسایی، قورسی، گرانی 2 ڕاکێشان، کێشی زەوی 3 ڕادە یان پلەی کێشان 4 مەندی، قورسی، سەنگینی 5 گرنگی 6 سەختی، بەرشتبوون ۞ 1 ثقل، گرانی 2 جاذبه 3 میزان کشش 4 وقار، متانت 5 اهمیت 6 جدیت
**gravlax** /ˈgrævlæks/ *noun*, also gravadlax
گراڤلەکس: چێشتێکی سکاندیناڤی ۞ گراولکس
**gravure** /grəˈvjʊə/ *noun*
گراڤور، وێنە، شێوە، نەخش، کورتەی photogravure ۞ گراور، صورت، نقش، تصویر
**gravy** /ˈgreɪvi/ *noun, pl.* gravies
1 گۆشتاو، ئاودانەوە، سۆسی گۆشت، ئاوگی گۆشت، ئاوی گۆشت، ڕینگاو؟، چەوراو 2 پارەی مفتە، مەرز، پوولی مفتە (بەدەس‌هاتوو) ۞ 1 سس گوشت، آب‌گوشت، مرق 2 پول بادآورده
**gravy boat** *noun*
سۆس‌خۆری، دەفر یا قاپی سۆس ۞ ظرف سس
**gravy train** *noun*
نانی ئاسوودە، کاری باش و بێ‌دەردەسەر ۞ منبع درآمد بی‌دردسر
**gray**[1] /greɪ/ = grey
**gray**[2] /greɪz/ *noun, abbreviation* Gy
(فیزیک) گرای (یەکەیێکی جیهانی، بەرامبەر بە یەک ژوول لە هەر کیلۆگرەمدا؛ بنەڕەت: لە ناوی تیشکەزیندەناس Louis H. radiobiologist (*Gray* ۞ گرای
**grayfish** *noun, pl.* same or grayfishes
سەگەماسی dogfish ۞ سگ‌ماهی
**grayish** /ˈgreɪɪʃ/ = greyish
**grayling** /ˈgreɪlɪŋ/ *noun*
1 جۆرێ ماسی خۆراکی ئاوی شیرین [توخم *Thymallus*: چەندین جۆرن] 2 پەپوولەیێ بە پنکەچاوی گەشەوە و ژێرباڵی بۆرەوە [*Hipparchia semele*] ۞ گرایلینگ
**gray trout** *noun*
جۆرێ ماسی‌یەخاتوونە ۞ نوعی ماهی قزل‌آلا
**graywacke** = US spelling of greywacke
**graze** /greɪz/ *noun*
1 برین، داماڵکان، رووشان 2 لەوەڕین ۞ 1 خراشیدگی 2 چرا
**grazed** *adjective*
داماڵکاو، بریناوی، زەخمار، رووشاو ۞ خراشیده

**grazer** *noun*
لەوەڕندە، لەوەڕخۆر، لەوەڕۆک ۞ چرنده
**grazier** /ˈgreɪziə(r)/ *noun*
ئاژەڵڕاگر، ئاژەڵدار، مەڕومالات‌بەخێوکەر، چۆدار ۞ دام‌دار، چوبدار
**grazing** /ˈgreɪzɪŋ/ *noun*
چرگ، لەوەڕ، جێ‌لەوەڕ، پاوە، گیاجاڕ، چێری، چەولیک، پاوان ۞ چراگاه
**grazing land** *noun*
چرگ، گیاجاڕ، جێ‌لەوەڕ، چێری، چەولیک، مێرگ، بژوێن ۞ چراگاه
**grease** /gri:s/ *noun*
1 ڕۆن، ڕۆن یان بەزی دووگ، چەوری، بەز: *Grease marks can be removed with plates covered with ◊ liquid detergent* 2 *the grease in his hair ◊ grease*، گریس، ماسلە 3 پیوی قاڵ‌کراو 4 ڕۆنی گیانەوەری 5 خوری تازەبڕاو (و خاوێن نەکراوەتەوە) ۞ 1 روغن، چربی 2 گریس 3 پیه‌ی گداخته 4 روغن حیوانی 5 پشم تازه چیده
**grease-gun** *noun*
پۆمپی گریس یان ماسلە، گریس‌تێکەر ۞ تلمبه‌ی گریس‌کاری
**grease monkey** *noun*
(ناڤەرمی) دەزگەوان، میکانیک ۞ (عامیانه) مکانیک
**greasepaint** /ˈgri:speɪnt/ *noun*
ڕەنگی شانۆ، گریمی شانۆ ۞ گریم تئاتر
**greaseproof paper** /ˌgri:spru:f ˈpeɪpə(r)/ *noun*
کاغزی چەور ۞ کاغذ روغنی
**greaser** *noun*
گریس‌کار، ماسلەکار، ماسلەگەر، چەورگەر (ب.ت. مۆتۆڕەکانی کەشتی) ۞ گریس‌کار
**greasewood** *noun*
دارچەورە؟، دەوەنەچەورە؟: دەوەنێکی بالاکورتی چەوکی، بە دارێکی زەردی سەختەوە، لە ناوچە وشکەکانی ڕۆژاوای ئەمریکا شین دەبێ [ *Sarcobatus vermiculatus*] ۞ گریس‌وود
**greasily** *adverb*
چەوروچلێکانە، (خوازە) زمانچەورانە ۞ بە طور چرب، چاپلوسانه
**greasiness** /ˈgri:sinəs, US ˈgri:zinəs/ *noun*
1 چەوربوون، چەوروچلێک‌بوون 2 خزی، خلیسک‌بوون ۞ 1 چرب‌بودن 2 لیزی
**greasy** /ˈgri:si, US ˈgri:zi/ *adjective* (greasier, greasiest)
1 چەور، چەوروچلێک، گریساوی، ڕۆناوی، چەوراوی، خز، خلیسک: *greasy fingers/marks/overalls* 2 زمانچەورانە 3

شـقاقي؟، رۆنی هێنـاوە (لاقـی ئەسـپ) ◌ 1 چرب، لیز 2 تملق‌آمیز 3 روغن‌آورده

**greasy pole** *noun*
(نافەرمی) کۆلەکەچەورە، ستوونی رۆناوی یان چەور (بۆ پیاهەڵچوون وەکوو سەرقاڵی‌یێ) ◌ رستوران کثیف

**greasy spoon** *noun*
خواردنگەی کەوچک‌چەور، خواردنگەی پیس ◌ رستوران کثیف

**great** /greɪt/ *adjective* (greater, greatest), *noun, adverb*
*adj* 1 مەزن، گەورە، گەپ، زلە، زەلام: *Alexander the great* 2 گرنگ: *The wedding was a great occasion* ◊ *One great advantage of this metal is that it doesn't rust* 3 زۆر، فرە، زەبەند، گەلێک: *People were arriving in great numbers* 4 چاک، باش، قەنج، یەکجار باش، زۆر چاک، بێ‌هاوتا: *What a great goal!* 5 بەکەیف، دڵخۆش 6 شارەزا، سەرەندەرکردوو: *She's great at chess* 7 خۆش، بەتاسە، تامەزرۆ، بەپەرۆش *n* (the great or greats) گەورەکان، کەسانی نێوبەدەرەوە، کەسانی ناسراو: *He was one of boxing's all-time greats* *adv* یەکجار باش، زۆر چاک: *Well done. You did great* ◌ *adj* 1 کبیر، عظیم، بزرگ 2 مهم 3 وافر، بسیار 4 خوب، استثنایی 5 سرحال 6 ماهر، لذت‌بخش 7 مشتاق *n* (the great) بزرگان *adv* خیلی خوب

**great ape** *noun*
گەورەمەیموونی شێوەمرۆڤ (پێوەندی‌یێکی زۆریان بە مرۆڤەوە هەیە، gorilla و chimpanzee دەگرێتەوە [خێزانی Pongidae]) ◌ نوعی میمون

**great auk** *noun*
ئۆکەگەورە (ئاتلانتیکی باکووری [*Alca impennis*]) ◌ اوک بزرگ

**great-aunt** *noun*
پووری باوک یان دایک (هەردوو بەرە) ◌ خاله‌ی پدر یا مادر، عمه‌ی پدر یا مادر

**Great Bear** *noun*, also Ursa Major
(ئەستێرەوانی) حەوتەوانە، حەوت برا، ورچەگەورە ◌ دب اکبر

**Great Britain** *noun*
بریتانیای گەورە یا مەزن (ئینگلتەرە، ویلز و سکاتلەند) ◌ بریتانیای کبیر

**great circle** *noun*
(جوگرافی) گەورە بازنە، بازنەی گەورە ◌ دایره‌ی عظیمه

**greatcoat** /ˈgreɪtkəʊt, US -koʊt/ *noun*
باڵتە (قورس و درێژ ب.ت. هی سەربازان) ◌ پالتو

**Great Dane** /ˌgreɪt ˈdeɪn/ *noun*
قەپەگوڵ، سەگی زلەی مووکورت ◌ گریت دین

**greate divide** *noun*
سنووری نێوان ژیان و مردن ◌ مرز میان زندگی و مرگ

**Greater** *adjective*
گەورە (شار، گەرەک و هتد) ◌ بزرگ

**Great London** *noun*
لەندەنی گەورە ◌ لندن بزرگ

**great-grandchild** *noun*
نەوەزازا، بن‌نەوەزا، نەدیدە، نەڤیچرک ◌ نبیره

**great-grandfather** *noun*
باپیرەگەورە، باوکی باپیرە ◌ جد پدری، جد مادری

**great-grandparent** *noun*
باپیرەگەورە (چ هی دایک و چ هی باوک) ◌ جد پدر یا مادر

**great-grandson** *noun*
نەتیژە، نەوەزا، نەڤیچرک ◌ نتیجه

**great-hearted** /ˈgreɪt hɑːtɪd/ *adjective*
دڵ‌گەورە، گەورە ◌ بلندهمت

**great-heartedness** *noun*
دڵ‌گەورەیی، گەورەیی ◌ بلندهمتی

**Great Lakes** *noun, pl.*
گۆمە گەورەکان، گۆمە پێنجینەکان Lakes Erie, (لە Superior و Huron, Michigan, Ontario نێوان ئەمریکا و کەنەدا) ◌ دریاچه‌های پنج‌گانه

**greatly** /ˈgreɪtli/ *adverb*
یەکجار، زۆر، گەلێ زۆر: *People's reaction to the film has varied greatly* ◊ *The reports were greatly exaggerated* ◌ خیلی

**Great Mogul** *noun*
دەسەڵاتی ئیمپراتۆری مۆغوولەکان لە هیندی سەدەی 16دا ◌ مغول کبیر

**greatness** /ˈgreɪtnəs/ *noun*
1 گەورەیی، مەزنی 2 گرنگی 3 زۆری ◌ 1 عظمت 2 اهمیت 3 زیادی

**great-nephew** = grand-nephew

**great-nice** = grand-nice

**Great Power** *noun*
زلهێزەکان ◌ ابرقدرت‌ها

**Great Pyreneees** *noun, pl.* same
جۆرێ رەگەزی سەگی قەپە زۆرتر بۆ لای ئاژەڵ ◌ نوعی سگ

**great room** *noun*
دیوەگەورە، ژووری گەورە (کە چەند کاری لێ‌دەکرێ) ◌ اتاق بزرگ

**Great Russian** *adjective, noun*
وشەیێکی تر بۆ Russian (زمان و گەل)، کە لەگەڵ گەلان و زمانانی تری ئیمپراتۆری رووسیەی کۆن جیاوازی‌یان بێ ◌ گریت روسین

**great skua** *noun*
گەورەسکوویا [*Stercorarius skua*] ۞ نوعی پرنده

**Great Seal** *noun*
مۆری پاتشایی یان دەوڵەت ۞ مهر سلطنتی

**great tit** *noun*
گەورەگـۆرەوی‌چنـە، گـاگۆرەویلـە [*Parus major*] ۞ نوعی پرنده

**great-uncle** = grand-uncle

**great vowel shift** *noun*
گۆڕانی بزوێنەگەورە (هی ئینگلیسی نێوەڕاست) ۞ نوعی تغییر واکه‌ای

**the Great War** *noun*
شەڕی جیهانی یەکەم (1914_1918) ۞ جنگ جهانی اول

**great white shark** *noun*
شارکی زلەی سپی، شارکەزلەی سپی (جۆرێ شـارکی زۆر زلـەی راوی) [*Carcharodon carcharias*] ۞ کوسه‌ی سفید بزرگ

**great year** *noun*
ساڵەگەورە (ماوەیێکی دەوروبەری 25,800 ساڵ کە پێویستە بۆ سووڕێکی تەواوی بەرامبەرانی equinoxes دەوری سووڕگەی خۆر ۞ گریت ییر

**greave** /griv/ *noun*
پووزەوانە، زرێی بەلەک، بەلەک‌پێچ (لە زرێ) ۞ ساق‌پوش

**greaves** *noun, pl.*
تلتەی پیو ۞ تفاله‌ی پیه

**grebe** /gri:b/ *noun*
(گیانەوەرناسی) باڵـندەی دەریابـڕ، مـراوی دەریابـڕە(ئاوبـڕە)، مـراوی گوژیـو [خێـزان Podicipedidae: چەندین جۆرن] (بنەڕەت: لە *grebe* فەرەنسی) ۞ مرغ غواص

**Grecian** /'gri:ʃn/ *adjective*
1 یۆنانی‌ئاسا، بە شێوازی یۆنانی 2 (ئاماژە دەکا بە) سەربە هونەر و چاندی یۆنانی کۆن ۞ 1 یونانی‌شکل 2 وابسته به هنر و فرهنگ یونان باستان

**Grecian nose** *noun*
لووتی یۆنانی، لووتی ڕێک (هی ناوچاوان) ۞ بینی یونانی

**Grecism** = Graesicm

**greed** /gri:d/ *noun*
تـەماح، نـەوس، چڵێـسی، زگ‌بەردانـەوە، چاوچنۆکی، زگەڕۆیی: *His actions were motivated by greed* ۞ طمع، حرص و ولع

**greedily** /'gri:dili/ *adverb*
نەوسـنانە، بـە چڵێسـی، چڵێسانە: *She ate noisily and greedily* ۞ حریصانه

**greediness** /'gri:dinəs/ *noun*
نـەوس، چڵێسی، زگ‌بەردانـەوە، زگـەڕۆیی ۞ حرص، ولع

**greedy** /'gri:di/ *adjective* (greedier, greedicst)
چڵێس، نەوسن، چاوچنۆک، زگەڕۆ، ، زگـەڕۆ، زگ‌بـەردەرەوە فـارزک: *You greedy pig! You've already had two helpings!* ۞ حریص، شکمو

**greegree** = gris gris

**Greek** /gri:k/ *adjective, noun*
*adj* 1 سـەربە یۆنـان، ویتـانی، یۆنـانی 2 سـەربە زمانی یۆنانی *n* 1 زمانی نوێ و کۆنی هێند و ئەوروپایی یۆنانی 2 خەڵکی یۆنان، یۆنانی ۞ *adj* 1 یونانی 2 وابسته به زبـان یونـانی *n* 1 زبـان یونانی 2 اهل یونان

**Greek Catholic** *noun*
ئەندامی نەریت یان سروتی رۆژهەڵاتی کلێسەی کـاتۆلیکی رۆم؛ ئـەندامی کلێـسەی رۆژهـەڵاتی) ۞ کاتولیک یونانی

**Greek coffe** *noun*
قاوەی یۆنانی ۞ قاوه‌ی یونانی

**Greek cross** *noun*
خاچی یۆنانی (هـەر چوار پـەلی بەرامبـەرن) ۞ صلیب یونانی

**Greek fire** *noun*
(مێژوویی) ئاگری یۆنـانی (= مـاکێکی گـڕگێش، کە سەرەتا لە لایەن یۆنانی‌یەکانەوە بـەکارهێنرا) ۞ آتش یونانی

**Greek Orthodox** = Eastern Orthodox

**Greek Orthodox Church** *noun*, also Greck Church
کلێسەی ئۆرتۆدۆکسی یۆنانی یا رۆژهەڵات ۞ کلیسای ارتودکس یونانی

**Greek Revival** *noun*
پیاچوونەوەی یۆنانی: 1 شێوازێکی بیناسازی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم کە لاسایی شـێوازە یۆنـانی‌یـەکـان دەکاتـەوە 2 شـێوازێکی رازاندنـەوە (وەک کـەلوپـەلی نیومـال)، لاسـایی موتیف و نەخش و نیگاری یۆنانی کۆن دەکاتەوە ۞ رویوال یونانی

**green** /gri:n/ *adjective, noun*
*adj* 1 سـەوز، کەسـک، شـین، سەرسـەوز، سـەوزایی، شـینایی، سـەوزەلانی، شـیناوەرد 2 (میوە) کاڵ، شین، نەگەییو، فەریک، کاڵ‌وکرچ 3 ناسک، تورت 4 (دار) تەڕ، وشکەوەنەبوو، خاو 5 چاونـەکراوە، تازەکـار، کـەم‌ئـەزموون، خـاو، مناڵ، ناپوخت 6 سادە، ساویلکە 7 رەنگ‌بزرکاو، زەرد، رەنـگ‌نـەخۆش 8 کـاڵ، کـەم‌رەنـگ 9 یەکجار بەخیل، چاوپێ‌هەڵنەهاتوو 10 سـەربە ژینگەپارێزی، لایەنگری ژینگەپارێز، ژینگەپارێز *n* 1 رەنگـی سـەوز، رەنگـی کەسـک، سـەوز 2 بەرگی سەوز، جل‌وبەرگی سـەوز 3 سـەوزەلانی، سـەوزایی، شـینایی، شـیناوەرد، مێـرگ، شـوێنی

ســـەوز 4 (Green) ئەنـــدام یـــان لایـــەنگری پاراستنی ژینگە یاخود ژینگەپارێزی 5 پارتی سـەوزەكان ◌ *adj* 1 سبز، سبزەزار 2 نرسیدە 3 ترد 4 تر 5 بی‌تجربە 6 سادەلـوح 7 رنـگ‌پریـدە 8 كم‌رنگ 9 بسیار حسود 10 وابستە بە حفظ محیط زیست، طرفدار محیط زیست *n* 1 رنگ سبز 2 لباس سبز 3 سبزەزار 4 (Green) عضو یا طرفدار زیست‌بوم 5 حزب سبزها

**green algae** *noun, pl.*
قـــەوزەی ســـەوز (یـــان شـــین، هـــی ســـەر (تەختە)بەردی تەڕو خاو، داری شێ‌دار و ڕووی پۆنگـاو، كلـۆرۆفیلی تیایـە و لـە كلۆرۆپلاستی جیـاوازدا نـشاستە هـەڵـدەگرێتـەوە [دیـڤیژن Chlorophyta]) ◌ جلبک سبز

**greenback** /ˈgriːnbæk/ *noun*
(نافـەرمی) پـش(ت)سـەوز، پـارەی ئـەمریكایی، دۆلار ◌ پشت‌سبز

**green bean** *noun*, also French bean
(ڕووەكـناسی) پاقلەسـەوزە، لوبیاسـەوز ◌ لوبیا سبز

**green belt** *noun*
(دەوری شار) پشتێنەی سەوز ◌ كمربند سبز

**Green Beret** *noun*
كلاوســەوز: كۆمانـدۆ یـان ســەربازی تایبـەتی ئـــەمریكایی و بریتـــانی، ئـــەنـــدامی هێـــزە تایبەتی‌یەكانی ئەرتەشی ئەمریكا ◌ كلاه سبز

**greenblind** *noun*
سەوزكوێر، لە بەرامبەر سەوزدا چاوی نابینێ ◌ كارت سبزكور

**greenbottle** *noun*
شووشەسەوزە: جۆرێ مێشی سـەوزی میتالیک، جاروبار پرگ یان كرمینەكانی لەسەر برینی مەڕ یان پاتاڵی تر دادەنێ [*Lucilia Caesar* و جۆرە پێوەندی‌دارەكان] ◌ نوعی مگس

**green bug** *noun*
مێشوولەی سەوز [*Schizaphis graminum*] ◌ شتەی سبز

**green card** *noun*
كارتی سەوز ◌ كارت سبز

**green corn** *noun*
گەنمەشـامی هێنـدی كـە بـە كاڵـی بـۆ چێـشت بەكاردێرێ ◌ نوعی گیاه

**green earth** = terre verte

**greenery** /ˈgriːnəri/ *noun*
سـەوزایی، ڕووەكـی سـەوز، گیـاوگژی سـەوز، سەوزاوەرد ◌ گیاهان سبز

**green-eyed** /ˈgriːn aɪd/ *adjective*
چاوپێ‌هەڵنەهاتوو، بەئیرەیی، بەغیل ◌ حسود

**green-eyed monster** *noun*
(نافەرمی) دێوی ئیرەیی، چاوپێ‌هەڵنەهاتن ◌ دیو حسادت

**greenfield** /ˈgriːnfiːld/ *adjective*
(خاک) (لێ)دروس‌نەكراو، خـاک، دەق‌نەشكاو، مۆر، شیناوەرد، دەس‌لێنەدراو، ئاوەدان‌نەكراو: *a greenfield site* ◌ بكر

**greenfield site** *noun*
پەڵـەخاكی شیناوەرد یان دروس‌نەكراو، خـاک ◌ قطعە زمین بكر

**greenfinch** /ˈgriːnfɪntʃ/ *noun*
(گیانەوەرناسی) سـەیرەی سـەوز، سەوزەسـەیرە، ســـەوزەكۆ، ســـەقاقووش، كاسەڵكەشـــینكە، كەسەڵەشـــینكە، وەوەخـــوەرە؟، گـــونجگیر، ئەسپەشینە، كاسەڵەشینە، قڕاک [*Carduelis chloris*] ◌ سهرەی سبز

**green fingers** *noun*
دەس‌باشـــی لـــە باخـــەوانی‌دا، شـــارەزایی لـــە باخەوانی‌دا ◌ مهارت در باغبانی

**green-fingered** *adjective*
شارەزا لە باخەوانی‌دا، شارەزای باخـەوانی ◌ ماهر در باغبانی

**green flame** *noun*
كلفە، گڕی سەوز ◌ شعلەی سبز

**greenfly** /ˈgriːnflaɪ/ *noun, pl.* greenflies
مێشوولە، شەتە، مێشەسەوزە = aphid ◌ شتە

**greengage** /ˈgriːngeɪdʒ/ *noun*
1 هەڵـــووژەقادری، هەڵووەســـەوزە 2 دار یـــان دەوەنــێ كــە ئــەم بــەرە دەگــرێ [*Prunus domestica*] (بنـەڕەت: لـە نـاوی ڕووەكـناســی ئینگلیسی سێر William *Gage*، مەرگ 1820) ◌ 1 گوجە (سبز) 2 درخت گوجەی سبز

**greengrocer** /ˈgriːngrəusə(r), US -grou-/ *noun*
ســـەوزی‌فـــرۆش، ســـەوزەفرۆش، میـــوەفرۆش، تەڕەفرۆش ◌ سبزی‌فروش

**greengrocer's** *noun*
ســـەوزی‌فرۆشـــی، تەڕەفرۆشـــی، سەوزەفرۆشـــی، میوەفرۆشی، دووكـانی سەوزەفرۆشی، دووكـانی تەڕەفرۆشی ◌ مغازەی سبزی‌فروشی

**greengrocery** /ˈgriːngrəusəri/ *noun*, also greengroceries
ســـەوزی‌فرۆشـــی، سەوزەفرۆشـــی، میوەفرۆشـــی، دووكانی سەوزەفرۆشی ◌ مغازەی سبزی‌فروشی

**greenheart** *noun*
نێرکسەوز: درەختێكی سـەوزەونی ئـەمریكای باشووری، دارێكی سەختی هەیە و بۆ شتی ناو ئاو بـەكاردێرێ [*Ocotea rodiaei*] ◌ نـوعی درخت

**greenhorn** /ˈgriːnhɔːn, US -hɔːrn/ *noun*
1 كـەسـێكی چاونـەكراوە، ناپوختـە، تازەكـار، تازەدەس‌تێداو، ناشی 2 كەسێكی زووهەڵفریواو، سادە، ساویلكە ◌ 1 آدم ناشی 2 آدم سادەلوح

**greenhouse** /ˈgriːnhaus/ *noun*

گوڵخانە، سەوزگە، سەوزخانە، گەرمخانە ◯ گلخانە

**greenhouse effect** *noun*
کاریگەری سەوزخانەیی (کێشەی گەرمبوونی بەرەبەرەیی کەشی زەوی، بە هۆی زۆربوونی چەندین گاز وەکوو دوانۆکسیدی کاربۆن لە هەوای دەوروبەری زەویدا) ◯ اثر گلخانەای

**greenhouse gas** *noun*
گازی سەوزخانەیی ◯ گاز گلخانەای

**greening** *adjective*
سێوەشینە (بە گەییویش هەر شینە) ◯ سیب سبز

**greenish** /ˈgriːnɪʃ/ *adjective*
(رەنگ) سەوزەڵە، ئاماڵسەوز، مەیلەوسەوز، سەوزکار، سەوزکەڵە ◯ تقریباً سبز

**greenkeeper** /ˈgriːnkiːpə(r)/ *noun*
چاودێری یاریگەی گۆلف ◯ گرینکیپر

**Greenlandic** /griːnˈlandɪk/ *noun*
شێوەزارێکی ئیسکیمۆیی کە یەکێ لە زمانە فەرمییەکانی گرینلەندە (Greenlander *n*: خەڵکی گرینلەند، گرینلەندی) ◯ گرینلندی

**greenlet** /ˈgriːnlɪt/ *noun*
جۆرێ vireo چکۆلانە بە پەڕوباڵی بۆرەوە، لە ئەمریکای ناوەندی و باشووری [تـوخم *Hylophilus*: چەندین جۆرن] ◯ گرینلت

**green light** *noun*
1 چرای سەوز 2 دەستوور، ڕێدان، چرای سەوز: *The government has decided to give the ~n light to the plan* ◯ 1 چراغ سبز 2 اجازه

**greenling** *noun*
جۆرێ ماسی خۆراکی گۆشتخۆری پاسیفیکی باکووری [خێزان Hexagrammidae: چەندین جۆرن] ◯ گرینلینگ

**green man** *noun*
سەوزەپیاو، شینەپیاو ◯ گرینمن

**green manure** *noun*
پەیینەسەوزە (کردنی گیا بۆ مایەدارکردنی زەوی) ◯ گرینمانیور

**green mold** *noun*
کەرووی سەوز، تەم یان کەرەکیفەی شین یان سەوز ◯ کفک سبز

**greenness** /griːnnəs/ *noun*
1 سەوزایی، سەوزاوەرد، سەرسەوزی 2 ژینگەپارێزی، لایەنگری لە پاراستنی ژینگە ◯ 1 سرسبزی 2 طرفداری از زیستبوم

**green onion** = spring onion

**Green Paper** *noun*
راپۆری پێشنیارەکانی پەرلەمانی حکومەت بۆ وتوویژ ◯ پیشنویس لایحه

**Green Party** *noun*
پارتی سەوزەکان، پارتی لایەنگرانی ژینگەپارێزی ◯ حزب سبزها

**green peas** *noun*
پۆڵکە، نۆکەسەوزە، نۆکی سەوز ◯ نخود سبز

**green pepper** *noun*
بیباری دۆڵمە ◯ فلفل دلمەای

**green plover** *noun*
(گیانەوەرناسی) زیقاوڵە، زیقاوە، جیقۆڵە، lapwing ◯ خروس کولی

**green revolution** *noun*
1 گۆڕانکاری یان شۆڕشی سەوز، وەرگۆڕانی سەوز 2 لایەنگری پاراستنی ژینگە ◯ 1 انقلاب سبز 2 طرفدار حفظ زیستبوم

**greenroom** /ˈgriːn ruːm/ *noun*
دیو یا ژووری چاوەڕێمانەوە (تیاتر یا ستۆدیۆی تەلەفزیۆن) ◯ اتاق انتظار

**greens** *noun, pl.*
گژوگیای سەوز، سەوزە، سەوزایی، سەوزی ◯ گیاهان سبز

**Greens** *noun*
پارتی سەوز ◯ حزب سبز

**green salad** *noun*
سالادی سەوزە (ب.ت. کاهو) ◯ سالاد سبزیجات

**greensand** *noun*
(زەویناسی) لیمەسەوزە، ڕیکەسەوزە ◯ گرینساند

**greenshank** *noun*
لاقسەوزە، پێسەوزە: جۆرێ شێلاقەی زەلەی بۆر یان سپی بە لاقی درێژەی سەوزباوەوە [*Tringa nebularia*] ◯ نوعی پرنده

**greensick** /ˈgriːnsɪk/ *adjective*
تووشبوو بە کلۆرۆسیس یان سەوززوویی ◯ مبتلا به یرقان سفید

**greensickness** = chlorosis 1

**greenskeeper** /ˈgriːnzkiːpə(r)/ = greenkeeper

**green snake** *noun*
ماری سەوز، سەوزەمار: ژێرەوەی سپی یان زەردباوە [توخم *Opheodrys*: دوو جۆرن] ◯ مار سبز

**green soap** *noun*
سابوونەشینە، سابوونەسەوزە (لە ڕۆنی گژوگیا) ◯ نوعی صابون

**greenstick fracture** *noun*
جۆرێ شکانی ئێسک زۆرتر لە منالاندا، کە لەودا لایێکی ئێسکەکە دەشکێ و لایەکەی تری دەچەمێتەوە ◯ نوعی شکستگی

**greenstone** /ˈgriːnstəʊn/ *noun*
1 (زەویناسی) سەوزەبەرد، بەردەشینە (بەردی ئاگرین، feldspar و hornblende تیایە) 2 (زۆرتر لە نیوزیلەند) جۆرێ jade ◯ گرین استون

**greenstuff** /ˈgriːnstʌf/ *noun*
سەوزە ◯ سبزیجات

**green sinfish** *noun*

خورماسی سەوز، هی ناوچەی گۆماوە گەورەکان
○ [*Lepomis cyanellus*] the Great Lakes
نوعی ماهی

**greensward** /'gri:n,swɔ:d/ *noun*
(کۆن، وێژەیی) میرگ، شیناوەرد، چیمەن(چاپ) ○ چمن

**green tea** *noun*
چایی سەوز ○ چای سبز

**green thumb** = green fingers

**green turtle** *noun*
کیسەڵەشینە، کیسەڵەسەوزە (گۆشتەکەی دەخورێ، هی دەریا گەرمێن و نیمچەگەرمێنەکان [*Chelonia mydas*]) ○ نوعی لاک‌پشت

**green vegetable** *noun*
سەوزە (گەڵای سەوزی تاریک، وەک ئەسپەناخ) ○ سبزیجات

**green vitriol** *noun*
(کۆن) سولفاتی بلووریی ئاسنی ○ گرین ویتریول

**Greenwich Mean Time** /,grenɪtʃ 'mi:n taɪm, US -nɪdʒ/ *noun*
1 کاتی گرینیچ، کاتی جیهانی، سەعاتی جیهانی، کاتژمێری جیهانی 2 بە کاتی جیهانی (بنەڕەت: *Greenwich*ی لەندەن، شوێنی پێشووی ڕوانگەی پاتشایی Royal Observatory) ○ 1 وقت گرینویچ 2 به وقت گرینویچ

**greenwood** /'gri:nwʊ:d/ *noun*
(کۆن) دارستانی شین یان سەوز (کاتێ لق‌وپۆ و گەڵاکانی داویە بەیەکا)، ب.ت. وەک داڵدە و پەنایێ بۆ یاغی‌یان ○ جنگل سبز

**green woodpecker** *noun*
جۆرێ دارکونکەرەی زەرد و سەوزی گەورە، بە پۆپەیێکی سوورەوە [*Picus viridis*] ○ نوعی دارکوب

**greeny** /'gri:nɪ/ *adjective*
(ڕەنگ) سەوزەڵە، ئاماڵ‌سەوز، مەیلەوسەوز ○ تقریباً سبز

**greeting** /'gri:tɪŋ/ *noun*
1 درود، سڵاو، چاک‌وخۆشی: *She waved a friendly greeting* ◊ *They exchanged greetings and sat down to lunch* 2 (greetings) سڵاو، درود، چاک‌وخۆشی، پیرۆزبایی، چاوڕۆشنی(پێوتن): *My mother sends her greetings to you* ◊ *all Christmas/birthday, etc. greetings* ○ 1 درود، سلام 2 (در جمع) درود، تبریک

**greetings card** *noun*
کارتی پیرۆزبایی ○ کارت تبریک

**gregarious** /grɪ'geərɪəs, US -'ger-/ *adjective*
1 خوێن‌گەرم، ڕووخۆشی تێکەڵی خەڵک: *She's very outgoing and gregarious* 2 مێگەڵ‌ژی، ژیانی بەکۆمەڵ، دەستەیی، ژیانی مێگەلی (گیانەوەر و باڵندەکان، زیندەناسی) 3 (گیاکان) بۆڵ‌بۆڵ، بۆلی، هێشووهێشوو، هێشوویی ○ 1 معاشرتی، اجتماعی 2 گروه‌زی 3 کپه‌ای

**gregariously** /grɪ'geərɪəsli, US -'ger-/ *adverb*
ڕووخۆشانە، خوێن‌گەرمانە ○ به طور معاشرتی

**gregariousness** /grɪ'geərɪəsnəs, US -'ger-/ *noun*
خوێن‌گەرمی، ڕووخۆشی ○ اجتماعی بودن

**Gregorian calendar** /grɪ,gɔ:rɪən 'kælɪndə(r)/ *noun*
ڕۆژمێری گریگۆری (شێوەی دەسکاری‌کراوی ڕۆژمێری Julian لە 1582 لە لایەن پاپ گریگۆری سێزدەیەم، لە بریتانیای مەزن و کۆلۆنی‌یەکانی ئەمریکا لە 1752 پەسند کرا و ئێستاش بەکاردێتێ) ○ تقویم گریگوری

**Gregorian chant** *noun*
گۆرانی یان سترانەکانی گریگۆری (جۆرێ موسیقای کلێسەیی سەدەکانی ناوەڕاست بە ناوی پاپ گریگۆری (540–604)) ○ آوازهای گریگوری

**Gregorian telescope** *noun*
دووربین یان تێلێسکۆپی گریگۆری: جۆرێکی پەرچ‌دەرەوەی سەرەتایی (لە ناوی ڕیازی‌زانی mathematician سەدەی حەڤدەیەمی سکاتلەند James *Gregory*) ○ تلسکوپ گریگوری

**greisen** /'grʌɪz(ə)n/ *noun*
(زەوی‌ناسی) بەردێ بە ڕەنگی ڕۆشن لە ئەنجامی گۆڕانی گرانیت بەهۆی هاڵاوی گەرمای ماگماوە، تەختەبەردێکی کریستاڵی کە لە کوارتز و میکا پێکهاتووە و لە Cornwall و Saxony زۆرە ○ گریزن

**gremlin** /'gremlɪn/ *noun*
جنۆکە، بوونەوەرێکی خەیاڵی (یان خراپ) کە دەڵێن دەبێتە هۆی لەکارکەوتنی دەزگاکان یا کێشەی ئێلێکتریکی (ب.ت. فڕۆکە) ○ جن

**Grenache** /grə'naʃ/ *noun*
جۆرێ مەی ناوچەی Languedoc-Roussillon ی فەرەنسە ○ گرناچ

**grenade** /grə'neɪd/ *noun*
1 هەنارۆک، نارنجۆک: *rocket-propelled grenades* 2 شووشەیێ کە مەتریاڵی کیمیایی تیایە، بۆ تاقی‌کردنەوەی ژێراب یا کوژاندنەوەی ئاگر بەکاردێتێ (بنەڕەت: بە واتای pomegranate "هەنار") ○ 1 نارنجک 2 گریناد

**Grenadian** /grɪ'neɪdɪən/ *noun, adjective*
گرێنادایی، دانیشتووی گرێنادا، سەربە گرێنادا Grenada (لە کارائیب)، گرێنادایی، پێوەندی بە گرێناداوە هەیە ○ گرنادایی

**grenadier** /,grenə'dɪə(r), US -'dɪr/ *noun*

1 (مێژوویــی) ســەربازی هــەنارۆک‌هــاوێژ، نارنجۆک‌هاوێژ، نارنجۆک‌خەر 2 (رووەک‌ناسی، دار) هــەنار 3 جــۆرێ ماســی بنــەژی ئاسـایی سەرزل [خێزان Macrouridae: گەلێ جۆرن] 4 جــۆرێ waxbill ی ئــەفریکـایی قـاوەیـی سووربـاو، بە دەنووکی سوور و پاشەلی شینی گەشەوە [توخم *Uraeginthus*: دوو جۆرن] ⬡ 1 سرباز نارنجک‌انداز 2 (درخـت) انـار 3 نـوعی ماهی 4 نوعی پرنده

**Grenadier Guards** *noun*
سەربازی گاردی گرینادیەر (سپای بریتانیا) ⬡ سرباز گارد گرنادیر

**grenadilla** /ˌgrenəˈdɪlə/ = granadilla

**grenadine**[1] /ˈgrenədiːn/ *noun*
خۆشاو یا شەربەتی هەنار، هەناراو ⬡ شربت انار

**grenadine**[2] /ˈgrenədiːn/ *noun*
جـۆرێ پارچـەی هەوریـشمی یـان هەوریـشم و خوری ⬡ نوعی پارچەی ابریشمی یا ابریشم و پشم

**Grendel** *noun*, Old English
گرێندێل: دێوێکی پیاوخۆر لە رەگەزی Cain، بە دەســتی Beowulf دەکــوژرێ (لــە هــۆنراوەی Beowulf ی ئینگلیـسی کۆندا) ⬡ گرندل

**Gresham's law** *noun*
قـانوونی گریـشام: بۆچوونـێ لـە ئـابووریدا کـە دەڵێ: پارەی خراپ Bad money پارەی باش لە دەساودەس و گەڕ دەخا، واتا هەرچەند پارەی باش زۆرتر لە گەڕدا بێ، بەرەبەرە پارەی خراپ جێگاکــەی دەگرێتــەوە (بنــەڕەت: لــە نــاوی دارایــیناســی ئینگلتــەرە ســێر Thomas *Gresham*) ⬡ قانون گرشام

**gressorial** /ˈgreˈsɔːrɪəl/ *adjective*
پێ‌هەڵگرتوو، پێگرتوو، پێ‌ڕەوکە ⬡ قادر بـه راه رفتن

**Gretna Green** /ˌgretnə ˈgriːn/ *noun*
گرێتنـا گـرین (گونـدێ لـە سـکاتلەند نزیـک بـە سـنووری ئینگلتـەرە، لـە رابـردوودا شـوێنێکی بەناوبانگ بوو بۆ پێک‌گەیشتنی دوو دڵدار کە نەیاندەتـوانی لـە نـاوخۆی ئینگلتـەرە بەیـەک بگەن) ⬡ گرتنا گرین

**Grevy's zebra** *noun*
ئەسپەکێوی میل‌باریک: جۆرێ ئەسپەکێوی رۆژهەڵاتی ئەفریکا، تەنگەسپی و میل‌باریک [*Equus grevyi*] ⬡ نوعی گورخر

**grew** /gruː/ = past of grow

**grey** /greɪ/ *adjective, noun*, US gray
*adj* 1 بــۆر، فیلــی، شــینکی، قورقــوشمی، خۆڵەمێشی، سوربی، (قژ) بۆز، سپی(تێکەوتوو)، (کەسێ) قژبۆر، مووبۆر، گەورە، ماش‌وبرنجی، مووبــۆز 2 پیرانــە 3 کــۆن، قــەدیمی 4 دڵــساردکەرەوە، ناهومێدکــەر 5 (روخــسار) رەنگ‌بزرکاو، زەردهەڵگەڕاو 6 (هەوا) هەوری، لێڵ، تاریک 7 ماندووکەر، عاجزکەر، وەڕەزکەر، دڵتەنگ‌کەر، هیچ 8 ئاسایی، بێ‌ناونیشان، بێ‌نێو 9 (رەنگ) توند، تۆخ *n* 1 رەنگی بۆر: *the dull grey of the sky* 2 جل‌وبەرگی بۆر: *dressed in grey* 3 ئەسپی بۆر یان سپی: *She's riding the -ey* ⬡ *adj* 1 خاکستری، طوسی، جوگندمی، دارای موهــای جوگنــدمی 2 پیرانــە 3 قــدیمی 4 یأس‌آور 5 رنـگ‌پریـده 6 (هـوا) ابـری 7 بـی‌روح، ملال‌آور 8 عادی، گمنام 9 تیره *n* 1 رنگ خاکـستری 2 لباس خاکستری 3 اسب سفید یا خاکـستری

**grey area** *noun*
بـارودۆخی دژوار، دۆخـی ئاڵـۆز، بابـەتی دژوار، رەوشی نادیار، رەوشی لێڵ، رەوش یـان مـژاری تەماوی ⬡ موضوع مبهم، وضع مبهم

**greybeard** /ˈgreɪbɪəd, US -bɪrd/ *noun*
پیرەپیــاو، پیــاوی بەســاڵاچوو، ریــش‌ســپی، ردێن‌سپی، ریش‌چەرموو: *the greybeards of the art world* ⬡ مرد سال‌خورده، ریش‌سفید

**grey eminence** = eminence grey

**Grey Friar** *noun*
رەبـەن یـان دەروێـشی تـیرەی Franciscan ⬡ گری فریر

**grey-haired** *adjective*
بۆز، ماش‌وبرنجی ⬡ با موهای جوگندمی

**grey-headed** *adjective*
مووسپی، سەرسپی، پیر، بە تووکی سپی‌یەوە ⬡ پیر

**greyhen** /ˈgreyhen/ *noun*
مێی کورکورە یا کەتی رەش، کورکورەڕەشەی مێ ⬡ مادەی باقرقرەی سیاه

**greyhound** /ˈgreɪhaʊnd/ *noun*
تاجی، تاژی، تانجی، سەگ‌تانجی ⬡ سگ تازی

**greyhound racing** *noun*
پێشبڕکێی تاجی، تاژی‌بڕکێ ⬡ مسابقەی سگ تازی

**greying** *adjective*
(تووک) ماش‌وبرنجی، بۆز، روو لە سپی‌بوون ⬡ جوگندمی

**greyish** /ˈgreɪɪʃ/ *adjective*
بۆرەڵووک، مەیلەوبۆر، بۆریلە، بۆرکار، بۆرباو، ئاماڵبۆر، کەمێ بۆر: *greyish hair* ⬡ مایـل بـه خاکـستری

**greylag** /ˈgrailæg/ *noun*
قازەبۆرە: قازی ماڵی لە بەرەی ئەوون [*Anser anser*] ⬡ گری‌لاگ

**grey market** *noun*
بازاڕی بۆر، بۆرەبازاڕ ⬡ بازار خاکـستری

**grey matter** *noun*
1 مادەی بۆری مێشک، ماکەبۆرینەی مێشک 2 (ئاقەزمی) مێشک، هۆش، intelligence ⬡ 1 مادەی خاکستری مغز 2 مخ

**grey mullet** *noun*

جۆرێ ماسی ئەستووری ئاوە کەناری و ڕێزگەیی‌یەکان [خێزان Mugilidae: چەندین جۆرن] ◌ نوعی ماهی

**greyness** /'greməs/ *noun*
1 بۆرێتی، بۆربوون 2 ڕەنگ‌بزرکاوی، ڕەنگ‌پەڕیوی، زەردی 3 تاریکی، هەوری‌بوون 4 وەڕەسکەری، شەکەتی، ماندوویی، هیچی ◌ 1 خاکستری‌بودن 2 رنگ‌پریدگی 3 تیرگی 4 کسل‌کنندگی، بی‌روحی

**grey seal** *noun*
بەرازەبۆری ئاوی: جۆرێ بەرازی ئاوی گەورەی ئەتلانتیکی باکووری، پێستی خاڵ‌خاڵی بۆرە [*Halichoerus grypus*] ◌ نوعی فُک

**grey squirrel** *noun*
سمۆرەبۆرە (ڕەسەنی ڕۆژهەلاتی ئەمریکای ناوەندی، بردراوە بۆ بریتانیا و شوێنەکانی تر [*Sciurus carolinensis*]) ◌ نوعی سمور

**greywacke** /'greɪwakə/ *noun*, US graywacke
(زەوی‌ناسی) بەردەلمی دەنک‌زبری ڕەش کە زیاتر لە سەدی پازدەی گڵ تیایە ◌ گری‌واک

**grey water** *noun*
ئاوەبۆرە، بۆراو (لەگەڵ black water بەراوردی کە) ◌ گری‌واتر

**gribble** /'grɪbl/ *noun*
مۆرانەی دەریایی یان ئاوی: هەریەک لە دوو ئیزۆپودی دەریایی داربڕ [*Limnoria lignorum* و *L. tripunctata*] ◌ موریانەی دریایی

**gricer** /'grʌɪsə/ = trainspotter

**grid** /grɪd/ *noun, adjective*
*n* 1 تۆڕ 2 نەردە 3 تۆڕی خانەخانە یان چوارگۆشاوی، شیش‌بەند، میل یان شیشی تۆڕی، تۆڕی چوارخانەیی 4 تۆڕی ئیلیکتریسیتە: *the development of the country's electricity grid* 5 (ماشێن) جێ‌بار، باربین، باربەند، باربەست *adj* 1 تۆڕێتراو، تۆڕتۆڕ، خانەخانە 2 تۆڕەهێڵی سەر نەخشە بۆ دەس‌نیشان‌کردنی دروستی شوێنێ ◌ *n* 1 شبکه 2 نرده 3 شبکه‌ی شطرنجی 4 شبکه‌ی برق 5 باربند *adj* 1 شبکه‌بندی‌شده 2 گرید

**grid condenser** *noun*
بارگەگری تۆڕی، خەستێنەی تۆڕی ◌ خازن شبکه

**grid current** *noun*
تەوژمی تۆڕ، تەزووی تۆڕی ◌ جریان شبکه

**grid circuit** *noun*
خولی تۆڕ(ی) ◌ دور شبکه

**gridder** *noun*
یاریزانی تۆپێنی ئەمریکایی ◌ بازی‌کن فوتبال امریکایی

**griddle** /'grɪdl/ *noun*
1 تاوە، ساج 2 (مێژوویی) بێژنگی سیمی، سەرێنی تێلی (لە کانگا، بنەکەی تێلبەندە) ◌ 1 تابه 2 غربال سیمی

**gridiron** /'grɪdaɪən, US -aɪərn/ *noun*
1 گۆشت‌برژێن، شیشی تۆڕی، گۆشت‌برژە، تۆڕی گۆشت برژاندن 2 یاریگای تۆپێنی ئەمریکایی 3 (ئەمریکای باکووری) یاری تۆپێن یان فوتبۆلی ئەمریکایی 4 نەخشی و پاتێرنی تۆڕی، ب.ت. هی شەقامەکان ◌ 1 کباب‌پز 2 زمین بازی 3 بازی فوتبال امریکایی 4 گریدآیرن

**gridlock** /'grɪdlɒk, US -lɑ:k/ *noun*
تۆڕبەندان، شەقام‌بەندان، ڕێبەندان، ڕێبەستان (دوخێ کە شەقامەکان پڕن لە ماشێن و ڕێگای جوولان نییە) ◌ گریدلاک

**grief** /gri:f/ *noun*
1 خەم، پەژارە، نارەحەتی، خەفەت، کەسەر، کۆڤان 2 مایەی خەم و نارەحەتی ◌ 1 اندوه، غصه 2 موجب ناراحتی

**grief-stricken** *adjective*
خەمبار، لێوبەبار، دڵپڕ، نارەحەت، کۆڵیل، خەماوی، ماتەمبار: *There was no way of consoling her -f-stricken family* ◌ غم‌زده، غصه‌دار

**griefless** *adjective*
بێ‌خەم ◌ بدون غصه

**grievance** /'gri:vəns/ *noun*
1 سکالا، گازندە، گلەیی، نالە، دەردی دڵ، شکات 2 نارەزایی (دەربڕین) 3 نگەرانی ◌ 1 تظلم، شکایت 2 اعتراض 3 نگرانی

**grieved** *adjective*
بەخەم، نارەحەت، خەمبار، دڵخوێن، دڵتەنگ، پەژارەبار، دڵپڕ ◌ غصه‌دار، اندوهناک

**grievous** /'gri:vəs/ *adjective*
1 بەژان، جەرگبڕ، بەئازار، دڵتەزێن، خەماوی، بەسوێ 2 توند، سەخت، قووڵ، گران، بەئێش: *a grievous wound* ◊ *grievous loss* 3 گەورە، قورس، ماڵوێرانکەر ◌ 1 دردناک، غم‌انگیز 2 شدید، فاحش، حاد 3 سنگین

**grievous bodily harm** *noun*
(ماف) ئێدان و برین‌دارکردن، تاوانی بوونەهۆی برین‌داری‌یێکی لەشی سەخت ◌ ایراد ضرب و جرح

**grievously** /'gri:vəsli/ *adverb*
بە سەختی، بە توندی، توند: *grievously hurt/wounded* ◌ به شدت

**grievousness** /'gri:vəsnəs/ *noun*
1 بەئێشی، بەژانی، جەرگبڕی 2 سەختی، توندی ◌ 1 دردناکی 2 شدت

**griffin** /'grɪfɪn/ *noun*, also gryphon or griffon /'grɪfən/
هەڵۆشێر (بوونەوەرێکی ئەفسانەیی بە سەر و باڵی هەڵۆ و لەشی شێرەوە، میسۆلۆژی یونان و

رۆم) ◌ شیردال

**griffon** /ˈgrɪfən/ *noun*
1 جۆری سەگی تانجی‌ناسای چکۆلە 2 (هەروەها griffon vulture) جۆری دالەکەرخۆر [*Gyps fulvus*] و جۆرە پێوەندی‌دارەکان] 3 variant spelling of griffin ◌ 1 گریفون 2 نوعی لاشخور

**grift** *noun*
(ئاخەرمی و ئەمریکا) نیمچەدەسبڕی ◌ شیادی جزئی

**grifter** *noun*
نیمچەدەسبڕ ◌ شیاد جزئی

**grig** /ˈgrɪg/ *noun*
1 مارماسی چکۆلە، مارماسیلکە 2 کوللە، کول 3 سیسرک ◌ 1 مارماهی کوچک 2 ملخ 3 زنجره

**gri-gri** = gris-gris

**grill** /grɪl/ *noun*, also grille
1 گۆشت‌برژێن، گۆشت‌برژە، شیشی تۆڕی، تۆڕی گۆشت یان کەباب برژاندن 2 کەباب 3 کەباب‌خانە، کەبابی 4 نەردە 5 خواردنگەیێ کە کەبابی ئامادە دەکا ◌ 1 کباب‌پز 2 کباب 3 کباب‌خانه 4 نرده 5 گریل

**grillade** /ˈgrɪlɪdʒ/ *noun*
جۆری خۆرشتی گۆشتی فەرەنسە یان Canjun ◌ گریلاد

**grillage** /ˈgrɪlɪdʒ/ *noun*
تۆڕبەند(ان)، چوارچێوەیەکی قورسی لە تۆڕێکی تەختەبەند یان دەستەک‌بەند (ی تێکهەڵکێش) بۆ دارشتنی تەرکی خانووبەرەیێ لەسەر عەرزێکی سست ◌ گریلاج، گریلاژ

**grille** /grɪl/ *noun*
1 تۆڕ: *a radiator grille* 2 نەردە، پارێزەی شووشەی: *a security grille* 3 پەنجێرەی تۆڕی یان تۆڕتۆڕ ◌ 1 شبکه 2 نرده 3 پنجرەی مشبک

**grilled** *adjective*
1 برژاو، براشتی، برشتە 2 نەردەدار، نەرداوی، نەردەرێژ 3 تۆڕتۆڕ، تۆڕی، تۆڕدار ◌ 1 کباب‌شده 2 دارای نرده 3 مشبک

**grilling** /ˈgrɪlɪŋ/ *noun*
لێ‌پرسینەوە، پرسیار و وەڵام، کونەجەرگ‌کردن یان هەڵپێچان بە پرسیار: *The minister faced a tough grilling at today's press conference* ◌ بازخواست، سین‌جیم

**grillwork** *noun*
تۆڕسازی ◌ شبکه‌سازی

**grilse** /grɪls/ *noun*
سالمون یان ماسی ئازاد کە گەڕاوەتەوە بۆ ئاوی شیرین دوای ئەوەی کە زستانێ لە دەریادا بووە ◌ گریلس

**grim** /grɪm/ *adjective*
1 مۆن، گرژ، ڕشت، مڕومۆچ 2 سەخت، گران، بێ‌ئەمان 3 ناخۆش، تاڵ، خراپ 4 دڵتەزێن، جەرگبڕ، ترسناک، ترسێنەر، بێ‌بەزەیی‌یانە 5 نگریس 6 خەماوی، نگەران‌کەر، خەمبار، دڵپڕ، نارەحەت‌کەر، بەژان 7 نەخۆش، ناساز 8 شپرزە، خراپ، ناخۆش (grimly /ˈgrɪmli/ *adv*: بە سەختی، سەخت؛ grimness /ˈgrɪmnəs/ *n*: 1 سەختی 2 ڕەنج، مۆنی، گرژی، مڕومۆچی؛ ئینگلیسی کۆن، ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ 1 عبوس 2 توان‌فرسا 3 ناگوار 4 مهیب، بی‌رحمانه 5 شوم 6 اندهبار، حزن‌آور 7 بیمار 8 افتضاح

**grimace** /grɪˈmeɪs, US ˈgrɪməs/ *noun*
1 دەمەلاسکە، ئەدا، لاسایی، ئەدا و ئەتوار: *to make/give a grimace of pain* 2 مۆن، گرژ، مڕومۆچ (grimacer *n*) ◌ 1 شکلک، ادا 2 اخم

**grimalkin** /grɪˈmalkɪn, US -ˈmɔːl-/ *noun*
1 پشیلە، پشیلەی مێ (پیر) 2 پیرێژنی رقاوی یا بوغزاوی ◌ 1 گربه، گربەی ماده 2 پیرزن مغرض

**grime** /graɪm/ *noun*
پیسی، چڵکنی، ڕەشی، دوکەڵاوی‌بوون (grimily *adv*: بە شێوەیەکی چڵکن و پیس؛ griminess *n*: چڵکنی، ڕەشی، پیسی) ◌ کثافت

**Grimm's law** *noun*
(زمانەوانی) قانوونی گریم: را و بۆچوونێ کە هێندێ نەبزوێن لە زمانانی ئەڵمانی‌دا گۆڕانێکی ڕێک‌وپێکی بەسەردا دێ کە لە زمانەکانی دی وەک یۆنانی و لاتین‌دا نابینرێ (بنەڕەت: لە ناوی زمانەوان philologist و فۆلکلۆریستی ئەڵمانی Jacob *Grimm*) ◌ قانون گریم

**grimoire** /grɪmˈwɑː/ *noun*
کتێبی ئەفسوون، نێرەنگ، وێرد و نووشتەی جادوویی ◌ گریموير

**Grim Reaper** *noun*
شتێکی خەیالی کە مەرگ پیشان دەدا و شێوەی پەیکەری مرۆڤ دەدا و عابایەکی لەبەر دایە، مەڵەغانێکی scythe پێیە ◌ گریم ریپر

**grimy** /ˈgraɪmi/ *adjective* (grimier, grimiest)
چڵکن، پیس، ڕەش، دووکەڵاوی: *grimy hands/windows* ◌ چرک، کثیف

**grin** /grɪn/ *noun*
ڕیچان، ڕیچە، پێکەنینێ کە دەم‌وددان بەدەرکەوێ ◌ خنده

**grind** /graɪnd/ *noun*
1 ئاش 2 ئاش‌کردن، هاڕین، لێکردن، ساوینەوە 3 کاری گران، کاری سەخت، گیان دەرهاتن 4 چالاکی ماندووکەر، کاری سەخت ◌ 1 آسیا 2 آسیاب کردن، سایش 3 کار شاق 4 فعالیت خسته‌کننده

**grinder** /ˈgraɪndə(r)/ *noun*
1 دەزگای لێکردن یان هاڕین، ئاش: *a coffee grinder* 2 ـتیژکەر ◌ 1 دستگاه آردسازی، آسیا 2 ـتیزکن

**grindery** /ˈgraɪndərɪ/ *noun, pl.* grinderies
کارگە یان کارخانەی تیژگەری، تیژگەری ◌ کارخانەی تیزگری

**grinding** /ˈgraɪndɪŋ/ *adjective*
1 سەخت، گران، گیان‌دەرهێن، پشت‌شکێن، 2 *grinding poverty*: کۆتاییپێنەهاتوو (دەنگ) کرە، کرەکر ( **grindingly** /ˈgraɪndɪŋlɪ/ *adv*: بە شێوەیەکی سەخت و گران) ◌ 1 طاقت‌فرسا 2 (صدا) جیرجیر

**grindstone** /ˈgraɪndstəʊn, US -stoʊn/ *noun*
1 بەرداش 2 چەرخ یان بەردی چەقۆتیژکردن، چەرخ، هەسان، بەراق، زبرە 3 بەیەکەزبرەی تیژکردن ◌ 1 سنگ آسیا 2 چاقوتیزکن 3 گریندستون

**gringo** /ˈgrɪŋgəʊ, US -goʊ/ *noun*
گرینگۆ (= ولاتانی ئەمریکای لاتین بۆ خۆبەسەرتردانان بەسەر ئەمریکاییەکان بەکاری دێنن) ◌ گرینگو

**griot** /ˈgriːəʊ/ *noun*
هۆنەر، شایەر و چیرۆکبێژی گەڕۆکی ئەفریکای ڕۆژاوا ◌ گریوت

**grip** /grɪp/ *noun*
1 گرتن، گیر، دەس‌لێ‌گیرکردن، هێزی گرتن، توانایی گرتن، گرۆکی، گیرایی 2 جێگای دەست، جێی‌دەس 3 دەسەلات، دەس‌بەسەراگرتن، هێز، کۆنترۆڵ 4 تێگەیشتن، پێ‌پێبردن، پێزانین 5 گیرە، مەنگەنە، گیرگە، بەست، دەسک، قوڵف، دەسگیرە، دەزگیرە 6 چنگ، مشت 7 دەرزی قژ 8 ساک، جانتا 9 (کۆن) گلەیی، شکات، لاری، گازندە، سکاڵا، دەربڕینی نارەزایەتی 10 (gripes) ژانەزگ، زگێشە، دڵەکزێ، بایێج، باوێنج 11 گوریس یان مەهاری کەشتی (grippy *adj*) ◌ 1 گیرش، عمل گرفتن، نیروی گرفتن 2 جای دست 3 تسلط، قدرت، مهار 4 دریافت، درک 5 گیره، دستگیره 6 چنگال 7 سنجاق سر 8 ساک، چمدان 9 شکایت، اعتراض 10 (gripes) شکم‌درد 11 مهار کشتی

**Gripe-Water** *noun,* also gripe water
(بریتانیا و دروشمی بازرگانی) دەرمانی ژانەزگ (منالان) ◌ گریپ واتر

**grippe** /grip/ *noun*
گریپ، پەتا، ئاهۆ، سەرمابوون، influenza ◌ سرماخوردگی

**gripping** /ˈgrɪpɪŋ/ *adjective*
سەرنج‌ڕاکێش، وروژێنەر، خۆش ◌ گیرا، مهیج

**grippingly** /ˈgrɪpɪŋlɪ/ *adverb*
بە شێوەیەکی سەرنج‌ڕاکێش یان وروژێنەر ◌ بە طور گیرا یا مهیج

**gripsack** /ˈgrɪpsæk/ *noun*
جانتای ڕێبواری ◌ خورجین سفری

**Griqua** /ˈgriːkwə/ *adjective, pl.* same or Griquas
گریکوا: ئەندامی گەلێکی ئەفریکای باشووری تێکەڵی ئەوروپایی و Khoikhoi ◌ گریکوا

**grisefulvin** /ˌgrɪzɪə(ʊ)ˈfʊlvɪn/ *noun*
گریزیۆفولفین: جۆرێ ئانتیبیوتیک کە دژی نەخۆشی کارگی یا کەڕوویی fungal موو و پێست بەکاردێترێ (بنەڕەت: لە *(Penicillium)* *griseofulvum* (سەرچاوەی بەکتریاکە) لاتینی نوێ، لە *griseus* لاتینی سەدەکانی نێوەڕاست "بۆرەلووک" + *fulvus* لاتین "زەردی سووریاو") ◌ گریس‌فولوین

**Griselda** *noun,* Middle English, from Italian
گریسێلدا: ژنێ لە ئەفسانەی سەدەکانی نێوەڕاستدا کە بەناوبانگ بووە لەبەر پشوودرێژی و تاقەت ◌ گریسلدا

**grisette** /grɪˈzɛt/ *noun*
1 قارچکەخۆشانەی دارستان بە کلاوێکی بۆر یان قاوەیی [*Amanita vaginata* و *A. fulva*] 2 ژنەفەرەنسی جەحێڵی کرێکار یان لە چینی کرێکار ◌ گریزت

**gris-gris** /ˈgriːgriː/ *noun,* also gri-gri, gree-gree
1 تەلەسم و دۆعای کارییبایی (یا کارائیبی) و ئەفریکایی 2 بەکارهێنانی نووشتە و تەلەسم ب.ت. لە voodoo دا ◌ گریس‌گریس

**grisly** /ˈgrɪzlɪ/ *adjective* (grislier, grisliest)
ترسناک، ترسێنەر: *a grisly crime* ( **grisliness** *n*) ◌ وحشتناک، مهیب

**grison** /ˈgrɪz(ə)n, ˈgrʌɪs(ə)n/ *noun*
بۆرە، گوان‌دارێکی مشکەخۆرەئاسا، بە تووکی ڕەشەوە لە ئەمریکای ناوەندی و باشووری [تۆخم *Galictis*: دوو جۆرن] (لە *gris* فەرەنسییەوە بە واتای "بۆر") ◌ گریسون

**grissular** /ˈgrɒsjʊlə/ *noun,* also grissularite
هەنگورەمارە: جۆرێ لەعل garnet لە سیلیکاتی ئالومینیۆمی کالسیۆم پێکهاتووە (gooseberry: لەبەر ڕەنگەکەی) ◌ نوعی نارسنگ

**grist**[1] /grɪst/ *noun*
ئەندازەی گوریس، ئەستوورایی گوریس یا کەندر ◌ کلفتی ریسمان

**grist**[2] /grɪst/ *noun*
1 گەنم یان جۆی ئاش، دەغڵی ئاش 2 جۆی ئاوکراو و هاراو بۆ دروستکردنی ئاوجۆ ◌ 1 گندم یا جو آسیاب 2 گریست

**gristle** /ˈgrɪsl/ *noun*
کرۆژە، کرکراگە، نەرمەی ئێسک، چەق (بنەڕەت نەزانراو) ◌ غضروف

**gristliness** /ˈgrɪslnəs/ *noun*
کرۆژەیی، کرکراگەیی، کرۆژەیی‌بوون ◌ حالت غضروف

**gristly** *adjective*, also gristled (gristlier, gristliest)
کرۆژاوی، کرکراگەدار، کرۆژەیی، کرۆژەدار ◌ دارای غضروف

**gristmill** /'grɪtmɪl/ *noun*
ئاش، ئاسیاو (گەنم) ◌ آسیاب

**grit** /grɪt/ *noun*
1 چەو، زیخ، ورکەبەرد 2 لەسەرمانەوە، بەبڕیاری، خۆڕاگری، سووربوون، کۆڵنەدان، ویست 3 ویران، ئازایەتی 4 (لە بەردا) رادەی سەختی، جەوهەر (بنەڕەت: *grout* ئینگلیسی کۆن، ئەڵمانی بنەڕەت، پێوەندیدار بە groats) ◌ 1 شن، ریگ، سنگریزە 2 ثبات، مقاومت، عزم، ارادە 3 جرأت 4 (در سنگ) درجەی سختی

**grits** /grɪts/ *noun, pl.*
ساوەر، سافار، پەتلە ◌ بلغور

**grittiness** /'grɪtiinəs/ *noun*
بەرجەرگی، ئازایەتی ◌ شجاع بودن

**gritty** /'grɪti/ *adjective* (grittier, grittiest)
1 زیخاوی، چەودار، ورکەبەرداوی: *a layer of gritty dust* 2 (نان) بە ئاردی ساوەرەوە، ساوەرین 3 بێباک، نەترس، بەغیرەت، بەجەرگ: *a gritty* ◊ *gritty determination* ◊ *performance from the British player* ◌ 1 شن‌دار، ریگ‌دار 2 بلغوری 3 شجاع

**grivet monkey** /'grɪvɪt/ = vervet monkey

**grizzle** /'grɪzl/ *noun*
قژی بۆز، مووی ماش‌وبرنجی ◌ موی جوگندمی

**grizzled** /'grɪzld/ *adjective*
(قژ) بۆز، ماش‌وبرنجی: *He looked old and grizzled* ◌ جوگندمی

**grizzly** /'grɪzli/ *noun*, also grizzly bear /ˌgrɪzli 'beə(r), US 'ber/
ورچەبۆرە، ورچی قاوەیی (رەسەنی رۆژاوای ئەمریکای باکووری و بەشێ لە رووسیا) ◌ خرس قهوەای

**Gro** = Grove

**groan** /grəʊn, US groʊn/ *noun*
ناڵە، نقە، نرکە، نزوولە، نووزە، هاوار، ئاهـ ئاهـ و ناڵە، هاڕژە ◌ نالە، فریاد

**groat** /grəʊt, US groʊt/ *noun*
(مێژوویی) گرۆت: کۆینێکی زیوین جاران لە ئەورووپا برەوی بوو و بایی چوار پێنسی زوو بوو ◌ گروت

**groats** *noun, pl.*
ساوەری جۆ، ساوەری زبر یان درشت ◌ بلغور جو

**grocer** /'grəʊsə(r), US 'groʊ-/ *noun*
بەقاڵ، خواردەمەنی‌فرۆش ◌ بقال، خوارووبارفروش

**grocer's** *noun*
دووکانی بەقاڵی، بەقاڵی ◌ بقالی

**grocery** /'grəʊsəri, US 'groʊ-/ *noun, pl.* groceries
1 بەقاڵی، خواردەمەنی‌فرۆشی 2 (groceries) خواردەمەنی ◌ 1 خوارووبارفروشی 2 (در جمع) خوارووبار

**grocery story** *noun*
بەقاڵی، خواردەمەنی‌فرۆشی ◌ خوارووبارفروشی

**grog** /grɒg, US grɑːg/ *noun*
1 خواردنەوەیێکی گیرا، لە بنەڕەتا رام rum بە ئاوتێکەڵ 2 (ئافەرمی، لە ئەوستڕالیا و نیوزیلەند) هەر خواردنەوەیێکی ئەلکوڵی، ب.ت. بیرە (ئاوجۆ) ◌ 1 مشروب آمیختە با آب 2 گراگ

**groggily** *adverb*
بێ‌هێزانە، لاوازانە، بە شێوەیەکی لاواز ◌ بە طور ضعیف

**grogginess** /'grɒginəs, US 'grɑːginəs/ *noun*
کزی، لاوازی، بێ‌گیانی، بێ‌هێزی ◌ ضعف، بی‌حالی

**groggy** /'grɒgi, US 'grɑːgi/ *adjective* (groggier, groggiest)
1 مەست، لاکەوتە، کەیل، سەرخۆش 2 بێ‌هێز، تێکچوو، پێچوو، کز، لاواز: *The sleeping pills left her feeling very groggy* 3 لەق، شل‌وشەویق ◌ 1 مست 2 نحیف، ضعیف 3 لق

**grogram** /'grɒgrəm/ *noun*
جۆرێ پارچەی زبری هەوریشمی ◌ گروگرام

**groin** /grɔɪn/ *noun*
1 (توێکاری) بنی ران، بێخی ران، تەراد، کورماتیخ، بەرموسلدان، سەرووی ران 2 (بیناسازی) رەگە، کەوانەبەست، تەقەڵگە، شوێنی لێکدانی دوو تاق 3 دیواری کەنار، کەنارپارێز = groyne (دار، بەرد، کۆنکرێت و هتد) ◌ 1 کشالەی ران 2 تویزە 3 حفاظ ساحل

**gromwell** *noun*
گیایێ لە تیرەی borage کە گوڵی شین و سپی هەیە [*Lithospermum officinale* و جۆرەکانی تر] ◌ نوعی گیاه

**groom** /gruːm/ *noun*
1 مەیتەر، ئەسپەوان 2 زاوا، زاڤا 3 (بریتانیا) یەکێ لە کاربەدەستانی خێزانی پاتشایی ◌ 1 مهتر 2 داماد 3 گروم

**groomed** /gruːmd/ *adjective*
ڕاهێنراو، پەروەردەکراو، ئامادە: *She is always perfectly -d* ◌ تعلیم‌دیدە

**groomsman** /'gruːmzmən/ *noun, pl.* groomsmen
برازاوا، شۆشبان ◌ ساقدوش

**groove** /gruːv/ *noun*
1 کووز(ک)، شوێن، شەقار، کانیشکاف، ناودڵە، ناوەدڵە، پلووسک(ە)، دۆڵ(ک)، کەندەک،

دیـراوه، دیراوکـه، چالـک، خـان، (درگـا و پەنجیرە) ڕەیل: *Cut a groove 3 cm from the top of the piece of wood* 2 خوو، ڕۆتین، پیـشە، عـادەت، ژیـانی ئاسـایی 3 (تافـەرمی) جۆرێ تایبەتی ریتمی موسیقا: *a jazz groove* ۞ 1 شیار، ریل 2 عادت، زندگی روزمره 3 نـوعی خاص از ضرب‌آهنگ موسیقی

**grooved** /gru:vd/ *adjective*

کووزکووز، کووزاوی، ناودڵـەدار، شـوێن‌شـوێن، دۆڵ‌دۆڵ، ڕەیل‌دار ۞ دارای شیار یا ریل

**groovy** /'gru:vi/ *adjective* (groovier, grooviest)

(تافەرمی)1 سەرنج‌ڕاکێش، جوان 2 ڕۆژبابـەت، تازەبابـەت، ئەمـرۆیی، ڕۆژەڤ، تازەبـاو، نـوژەن (ب.ت. لە شەستەکاندا بەکار دێترا) ۞ 1 جالب 2 مد روز، مدرن

**grope** /grəʊp, US groʊp/ *noun*

1 پەلکوتان، دەسکوتان، پەلەکوتێ، دەسـەکوتە، گـەڕان 2 جـوز(پێـوەکردن) دەس‌لێـدان، دەس‌پیاهێنـان، دەس بـۆ بـردن (بـە نیـازێکی سێکسـی‌یانە) ۞ 1 کورمال‌کورمال 2 انگولک

**groping** *noun*

1 پـەلکوتان، دەسکوتان، پەلەکوتێ، لەپـەکوتێ، گـەڕان 2 جـوز(پێـوەکردن) دەس‌لێـدان، دەس‌پیاهێنـان، دەس بـۆ بـردن (بـە نیـازێکی سێکسـی‌یانە) ۞ 1 کورمال‌کورمال 2 انگولک

**gropingly** *adverb*

پەلکوتان، دەسکوتان، پەلەکوتێ ۞ کورمال‌کورمال

**gropper** *noun*

پەلکوت، دەسکوت ۞ کورمال‌رو

**grosbeak** /'grəʊsbi:k/ *noun*

سەیرە و هی وەکوو ئەمە [چەندین جۆرن و لە خێزانەکانی Fringillidae و Emberizidae] ۞ سهره و مانند این

**groschen** /'grəUS(ɔ)n, US 'grɒʃ(ə)n/ *noun, pl.* same

1 یەکەی پارەی Austria، بەرامبەر بە سەدیەکی schilling 2 (مێژوویی) کۆینێکی زیوی چکۆلەی ئەڵمانیا ۞ گروسچن

**grosgrain** /'grəʊgreɪn/ *noun*

جـۆرێ پارچـەی میـل‌میلـی قـورس، زۆرتـر لـە ئاوریشم یان rayon ۞ گروس‌گرین

**gross** /grəʊs, US groʊs/ *adjective* (grosser, grossest), *noun*

*adj* 1 تێکـڕای، سـەرجەم: *Investments showed a gross profit of 26%* (زۆر) 2 قەڵەو، گمتە، زلە، ناقۆلا، ناهەموار، ناتەرز، قەبە، نالـەبار، زەلام 3 لەڕەوشـت بـەدوور، خـراپ، ناحـەز، ناشـیرین، عەیب، هەرزانە، بێ‌شـەرمانە، ناشکرا، دیار، بەرچاو: *a gross violation of human rights ◊ gross behaviour* 4 زبـر، (تـەن)درشـت 5 تونـد، ڕەق 6 پەسـندنەکراو، لەیاساونەهاتوو، نەبەخشراو 7 ناپوختە، ناپەتی، تێکـەڵ 8 (رووەک) چـڕ، پـڕ، بەپیـەکاداو 9 (چێشت) توند *n* دەستە (دوازدە دوجین بەرامبەر بە 144 دانە): *to sell sth by the gross* ۞ *adj* 1 جمـع کـل 2 چـاق، زمخـت 3 دور از ادب، ناشایست، فاحش، وقیحانه 4 درشت‌بافت 5 سـفت 6 غیرموجه 7 ناخالص 8 پرپشت 9 سفت *n* قراصه

**gross domestic product** *noun, abbreviation* GDP

بەرهـەمی تێکڕای نێوخـۆیی ۞ تولیـد ناخـالص داخلی

**grossly** /'grəʊsli, US 'groʊsli/ *adverb*

(خراپ) یەکجار، گەلێ، لەرادەبەدەر، بێ‌ئەندازە: *◊ grossly overweight/unfair/inadequate Press reports have been grossly exaggerated* ۞ فوق‌العاده، خیلی

**gross margin** *noun*, also gross profit

جیاوازی نێوان نرخی بەرهەم‌هێنان و فرۆش ۞ اختلاف میان ارزش تولیدی و فروش

**gross national product** *noun, abbreviation* GNP

بەرهـەمی تێکەڵـی نیشتمانی، بەرهـەمی تێکـڕای نەتەوەیی (یان نیشتمانی) ۞ تولید ناخالص ملی

**grossness** /grəʊsnəs, US groʊsnəs/ *noun*

1 بێ‌ڕەوشتی، بێ‌ماریفەتی، بێ‌ئەدەبی 2 زلەیی، گمتەیی، ناهـەمواری، ناقۆلایی، نالەباری ۞ 1 بی‌نزاکتی 2 گندگی، زمختی

**gross ton** = long ton

**grosz** /grɔ:ʃ/ *noun, pl.* groszy or grosze

یەکـەی پـارەی پۆڵەنـد، بەرامبـەر بـە سـەدیەکی zloty ۞ گروش

**grot**[1] /grɒt, US grɑ:t/ *adjective*

ئایەخ، گەن(د)وگوو ۞ آشغال

**grot**[2] /grɒt, US grɑ:t/ = grotto

**grotesque** /grəʊ'tesk, US groʊ-/ *adjective, noun*

*adj* 1 پێکـەنینی، گاڵتـەجار، قەشمـەری، سـەیر، سەیروسـەمەرە: *a grotesque figure ◊ tribal dancers wearing grotesque masks* 2 ناژیرانە، باوەڕپێنەکراو، ناحەز، کرێت، ناخۆش: *a ◊ The story was too grotesque to believe -tesque distortion of the truth* 3 گرۆتێسـک *n* 1 (وێنە، پەیکـەر و هتـد) ناشـیرین، ناحـەز 2 شـێوازی گرۆتێسـک لـە هونـەردا ۞ *adj* 1 مضحک، عجیب و غریب 2 بـی‌تناسـب، نـامعقول، زشت، ناخوشایند 3 گروتسک *n* 1 (تصویر، تندیس و...) زشت 2 سبک گروتسک

**grotesquely** /grəʊ'teskli, US groʊ-/ *adverb*

بە شێوەیەکی سەیر، سەیرانە ۞ به طور عجیب و

غریب

**grotesqueness** /grəʊˈtesknəs, US groʊ-/ *noun*
سەیربوون، سەیریتی ◌ غرابت

**grotto** /ˈgrɒtəʊ, US ˈgrɑːtoʊ/ *noun, pl.* grottoes or grottos
ئەشکەوت، کەورگ، ئەشکەوتی جوانی (ب.ت. دەسکرد و خۆش، بنەڕەت: لە *grotta* ئیتالیایی، بە ڕیگای لاتین لە *kruptē* یونانی) ◌ غار

**grotty** /ˈgrɒti, US ˈgrɑːti/ *adjective* (grottier, grottiest)
پیس، خراپ، بەکارنەهاتوو، ناخۆش، filthy، gross (grottiness *n*) ◌ کثیف، بد

**grouch** /graʊtʃ/ *noun*
1 بۆڵەبۆڵ، نقەنق، پرتەپرت، خوتەخوت 2 گلەیی، سکالا، کزەونزە، شکات، لاریبوون، دەربڕینی نارەزایەتی 3 ڕووناخۆشی، ڕووگرژی 4 مرۆی بەپرتەوبۆڵە، پرتن، بەبۆڵە ◌ 1 غرغر 2 شکایت، اعتراض 3 بدخلقی 4 آدم غرغرو

**grouchy** /ˈgraʊtʃi/ *adjective* (grouchier, grouchiest)
ڕووناخۆش، مرومۆچ، ڕووترش، بەدخولک، grouchiness ؛grouchily *adv*) peevish (/ˈgraʊtʃili/ *n* ◌ بدخلق

**ground**[1] /graʊnd/ *noun, adjective*
*n* 1 زەوی، زەمین 2 خاک، گڵ: *fertile ground for planting crops* 3 عەرز، سەرعەرز، وشکانی، ڕووی عەرز: *2 metres above/below ground* 4 مەودا 5 ناوچە، دەڤەر 6 بنکی دەریا، تەرکی زەریا 7 بنەڕەت، بنچینە، بناخە 8 تەخت، تەختایی، زەمینە: *pink roses on a white ground* 9 پارچە زەوییێ بۆ مەبەستێکی تایبەتی 10 بوار، مەڵبەند، پانتایی، ئاقار 11 ڕەوش، بارودۆخ 12 بابەت، مژار 13 هۆ، مایە، سۆنگە، پاساو، بەڵگە: *You have no grounds for complaint* 14 جێگا، قار، جێ، شوێن 15 خڵتە، بن، نیشتوو، تڵتە، بەگر 16 خاک، زەمین، مەیدان، گۆرەپان: *a football/recreation/sports, etc. ground* 17 (grounds) هۆیەکان، بەڵگەگان 18 حەوشە، باخچە، باغچە، دەوروبەر (خاک و باخانە)ی خانووبەرە: *The house has extensive grounds* 19 خڵتە یان تلپەی قاوە، بنی قاوە 20 وایەری زەمین *adj* 1 سەرعەرز، عەرزی، زەوینی 2 بنچینەیی، بنەڕەتی (فریز و زاراوەکان: above ground: زیندوو، زندی، زینوو ◊ below ground: مردوو، نێژراو، لەژێر خاکدا ◊ forbidden ground: بابەتی بەربەند(کراو)، بابەت یان مژاری کە نابێ قسەی لەسەر بکرێ ◊ common ground : بیر و رای هاوبەش، بوار و زەمینەی هاوبەش ◊ on the ground of: لەبەر، بەهۆی، بە خاتری ◊ on what grounds?: بە چ هۆیێ، لەسەر چ بنەمایێ؛ بنەڕەت: *grund* ئینگلیسی کۆن، ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ *n* 1 زمین 2 خاک 3 سرزمین، سطح زمین 4 فاصله 5 منطقه 6 ته دریا 7 اساس 8 زمینه 9 قطعه زمینی برای منظور خاصی، زمین 10 حوزه 11 وضع 12 موضوع 13 دلیل، سبب، علت 14 محل 15 تفاله 16 میدان 17 (در جمع) علل 18 باغچه، حیاط محوطەی ساختمان 19 لرد قهوه 20 سیم زمینی *adj* 1 زمینی 2 اساسی

**ground**[2] /graʊnd/ *adjective*
هاڕاو، ساوراو، لیکراو، ئاش کراو ◌ آسیاشده

**ground**[3] /graʊnd/ = past and past participle of grind

**groundage** /graʊndɪdʒ/ *noun*
مافی لەنگەرخستن ◌ حق لنگراندازی

**ground attack** *noun*
هێرشی زەمینی، پەلاماری عەرزی ◌ حملەی زمینی

**ground-bait** *noun*
چەشکە، چێشکە، چەشتە (بۆ ڕاوەماسی) ◌ طعمه

**ground ball** = grounder

**ground bass** *noun*
(موسیقا) بەم یان بەسی بنەڕەتی (تیمێکی بۆری کورت کە لە نێوان بەشەکانی موسیقایێ دووبارە دەبێتەوە) ◌ بم اصلی

**ground beef** = mince

**ground-breaker** *noun*
مرۆی داهێنەر، تازەگەر، پێشەنگ، ڕچەشکێن ◌ آدم خلاق، پیشتاز

**ground-breaking** *adjective*
داهێنەر، تازەگەر، پێشەنگ، ڕچەشکێن ◌ خلاق، پیشتاز

**ground cloth** = ground sheet

**ground colour** *noun*
ڕەنگی تەختە یان تەختایی، ڕەنگی زەمینە ◌ رنگ زمینه

**ground control** *noun*
کۆنترۆڵی سەرعەرز، مەهار یان کۆنترۆڵ لەسەر عەرزەوە، کۆنترۆڵ بەهۆی کەلوی چاوەدێرییەوە ◌ کنترل زمینی

**ground crew** *noun*
دەستەی فرۆکەوانی سەرعەرز (لە بەرامبەر دەستەی فرۆکەوانی ئاسمانی) ◌ خدمەی زمینی هواپیما

**grounded** *adjective*
بەبنچینە، بەبنەڕەت، بناخەدار: *remains grounded despite all the praise and attention* ◌ بااساس

**ground elder** *noun*
ورەعەرزیلە، بزاریکی ئاسایی لە تیرەی plarsley [*Aegopodium podagraria*] ◌ گروندر

ـەکان 2 مامۆستای ئایینی (دەسڕۆیشتوو)، مامۆستا ◌ 1 گورو 2 مرشد، معلم

**gush** /gʌʃ/ *noun*

1 فیشقە(کردن)، کفە(کردن) کوفارە، بازرەقە، هەڵقوڵین، پژان، گوربوون، دەرپەڕین، هەڵچوون، رژان 2 پەرگری، زیدەڕەوی، پەرگیری ◌ 1 جوشش، فوران، ریزش 2 افراط

**gusher** /ˈgʌʃə(r)/ *noun*

1 چاڵەنەوتی هەڵقوڵیو یان فیشقن، بیرەنەوتی فیشقەکردوو 2 مرۆی توندڕەو یان پەرگیر ◌ 1 چاه فورانی 2 آدم افراطی

**gushing** /ˈgʌʃɪŋ/ *adjective*, also gushy

1 لە هەڵقوڵیندا، هەڵقوڵیو، لە کفەدا، رووڵە هەڵچوون، لە فیشقە(کردن)دا 2 بەگوڕ، بەجۆش، بەتاو، بەتین ◌ 1 فورانی 2 پرحرارت

**gushingly** /ˈgʌʃɪŋli/ *adverb*

هەڵقوڵیوانە، فیشقەکردووانە ◌ بە طور جوشان

**gusset** /ˈgʌsɪt/ *noun*

1 (درووماندا) نافەک، گەرۆڵ، تیرۆژوو (درێژکۆڵەیی)، پیسیر، خشتەک 2 (بیناسازی) لەچکی، نافەکە، گاسیت 3 پشتبەستی گۆشە، گۆشە، گۆشەبەند (gusseted *adj*) ◌ 1 مرغک 2 لچکی 3 گوست، آهن زاویه

**gust** /gʌst/ *noun*

1 رەشەبا، بای توند، بای قایم، هەڵکردنی بای توند یان رەشەبا: *A gust of wind blew his hat off* ◊ *The wind was blowing in gusts* 2 رەهێڵە، ریژنە، بارینی بە خورەم 3 (ئاور، دووکەڵ و هتد) گرکێشان، کڵپەکردن 4 (خوازە) هەڵچوون، تەقینەوەی هەست و سۆز ◌ 1 توفان، وزش تند 2 رگبار 3 تنوره کشیدن 4 (مجازی) انفجار احساسات

**gustation** /gʌˈsteɪʃn/ *noun*

1 (کاری) چەشتن، چێژکردن، مەزەکردن، تامکردن، چێژان 2 هەستی چەشتن ◌ 1 ذائقە 2 حس چشایی

**gustative** /ˈgʌstətɪv/ *adjective*, also gustational

سەربە هەستی چەشتن ◌ وابستە بە حس چشایی

**gustatory** /ˈgʌstətəʊri/ *adjective*

سەربە چەشتن، چێژەرانە ◌ وابستە بە چشایی

**gusto** /ˈgʌstəʊ, US -toʊ/ *noun, pl.* gusto or gustoes

چێژ، تینوگوڕ، تاو، جۆش، تامەزرۆیی، بەپەرۆشی، تام، مەزە: *They sang with gusto* ◌ ذوق، اشتیاق، حرارت، طعم

**gusty** /ˈgʌsti/ *adjective* (gustier, gustiest)

1 رەشەبایی، ئاڵۆز، پڕبا، باهاتوو: *a gusty morning* 2 (با) توند، سەخت، قایم، ئاستەم 3 خۆش، بەمەزە، بەتام ◌ 1 توفانی 2 شدید 3 اشتهاآور

**gut** /gʌt/ *noun*

1 ریخۆڵە، رۆقی 2 زگ، گەدە، ورگ، کرش: *Have you seen the gut on him!* 3 دەزووی تەقەڵ (برینکاری) تەقەڵی نەشتەرگەری 4 ژێ (وەکوو بۆ فیۆلین) 5 دەربەندی تەنگ، تەنگەڵان، تەنگە، دەرتەنگ 6 کوڵان یان گوزەری تەنگ 7 (guts) هەناو، پزور، گورگانخواردوو، گرنگترین بەشی شتێک: *the guts of the problem* 8 وێران، نەترسی، ئازایەتی، بەغیرەتی 9 مرۆی زگەڕۆ ◌ 1 رودە 2 معدە شکم 3 نخ بخیە 4 زە 5 تنگە 6 کوچە یا معبر تنگ 7 (در جمع) احشا، مهمترین قسمت چیزی 8 جسارت 9 آدم شکمو

**gutbucket** *noun*

(ئافەرمی و لە بریتانیا) بنیادەمی زۆرخۆر، چڵێس، زگەڕۆ، نەوسن، زکوون ◌ آدم شکمو

**gutless** /ˈgʌtləs/ *adjective*

ترسەنۆک، بێدڵ، حیز، بێجەرگ ◌ ترسو

**gutlessly** /ˈgʌtləslli/ *adverb*

ترسەنۆکانە، حیزانە، بێجەرگانە ◌ بە طور ترسو

**gutlessness** /ˈgʌtləsnəs/ *noun*

ترسەنۆکی، بێدڵی، حیزی، بێجەرگی ◌ ترسویی

**gut rot** = rotgut

**gutsy** /ˈgʌtsi/ *adjective* (gutsier, gutsiest)

1 ئازا، بەجەرگ، چاوسوور، بەغیرەت، نەترس: *a gutsy decision* ◊ *a gutsy little fighter* 2 بەپێز، بەمایە، مایەدار، بەقەوەت، پرمایە 3 زگەڕۆ، چاوچنۆک (gustiness *n*؛ gustily *adv*) ◌ 1 شجاع، نترس 2 قوی 3 شکمو

**gutta** /ˈgʌtə/ *noun*

1 دڵۆپ، تنۆک 2 (بیناسازی) ئاوەجۆرە، ئاوجۆرکە ◌ 1 قطرە 2 گوتا

**gutta-percha** /ˌgʌtə ˈpɜːtʃə, US ˈpɜːrtʃə/ *noun*

جیر، گاتاپێرچا (جۆرێ کەتیرە کە لە چەندین جۆر داری مالیزیا (توخمەکانی *Payena* و *Palaquium*) دەگیرێ) ◌ گوتاپرکا

**guttate** /ˈgʌteɪt/ *adjective*

(زیندەناسی) خاڵخاڵ، خاڵدار، خاڵاوی، پنکەپنکە، تەوقتەوقن، پەڵەپەڵە (بنەڕەت: لە لاتین *guttatus* "speckled"، لە *gutta* "دڵۆپ") ◌ خالخالی

**guttation** /gʌˈteɪʃ(ə)n/ *noun*

دەردانی دڵۆپۆکەی ئاو لە کونیلەی رووەک، دڵۆپەڕژێ ◌ گوتاسیون

**gutted** /ˈgʌtɪd/ *adjective*

نارەحەت، مەیوس، پەشێو، خەمبار، وەڕەس ◌ غمگین، پکر

**gutter** /ˈgʌtə(r)/ *noun*

1 پلووسک، ئاوەڕۆ، پلوور، سووڵ، سوولاف،

پلـوره، لووسـاوک، ئـاوی سـەربان، تـۆری a leaking :پلووسـکەکان، پلووسـکەمەنی (پـاڵ شـەقام) 2 a blocked gutter ◊ gutter قانـاو، گـەنکاورەو 3 هـەژاری، تەنەکەنـشینی، گەڕەکی هەژارنشین، خوارشار 4 رۆژنامەیێ کە چیرۆکـی دڵـتەزێن دەربـارەی ژیـانی تایبـەتی خەڵـکەوە چـاپ دەکـا تـا نـارازیبوونیـان بخاتەڕوو، چاپەمەنی بازاڕی (gutterlike *adj*) ◌ 1 ناودان، آب روی بام، شبکەی ناودانها 2 جوی 3 محلەی فقیرنشین 4 گاتر

**gutter-bird** /ˈɡʌtə bɜːd/ *noun*
چۆلەکە، پاساری، سیڤاندۆک ◌ گنجشک

**gutter-child** /ˈɡʌtə tʃaɪld/ *noun*
منالی بەرەڵا و کۆلانگەڕ ◌ بچەی ولگرد

**guttering** /ˈɡʌtərɪŋ/ *noun*
1 تۆری پلووسکەکان، تۆری ئاوەڕۆ، پلووسکان، پلووسـکەکان، پلووسـکەمەنی 2 (را)کێـشانی پلووسکەکان 3 مێو یان بەزی تووەوەی شەمێ ◌ 1 شبکەی ناودانها 2 ناودانکشی 3 گلاترینگ

**gutter press** *noun*
چاپەمـەنی بـازاڕی (= رۆژنامـەیێ کـە زۆر چیرۆکی دڵتەزێن چاپ دەکا) ◌ گاتر پرس

**guttersnipe** /ˈɡʌtəsnaɪp, US -tərs-/ *noun*
منالی شڕەپۆش، منالی هەژار، منالی کۆلانگەڕ و بەرەڵا، منالی بێبەتی (guttersnipish *adj*) ◌ بچەی پارە و پورەپـوش، بچـەی فقیـر، بچـەی ولگرد

**guttiform** /ˈɡʌtəfɔːm/ *adjective*
دڵۆپئاسا، شێوەتنۆک، تنۆکی، دڵۆپی، تکەیی ◌ قطرەمانند

**guttler** *noun*
چلێس، چاوچنۆک ◌ حریص

**guttural** /ˈɡʌtərəl/ *adjective, noun*
*adj* 1 گـــــەرووی، قـــــوڕگی، بـــــینی، لەگەرووەدەرچوو: *-tural sounds* 2 (زمانەوانی) پـشتگـەرووی: *a* ◊ *guttural consonants* *n* نەبزوێنی قوڕگی یان *low guttural growl* گەرووی (ب.ت. وەکوو *g* و *k*) gutturalness *n* ؛gutturality *n* ؛gutturalism *n* ؛gutturally *adv*: لە گەروو(وە)) ◌ *adj* 1 حلقی، گلوخیز 2 پسکامی، حلقی *n* همخوان حلقی

**guttural consonant** *noun*
نەبزوێنی گاتیراڵ یان پشتگەرووی ◌ همخوان پسکامی

**gutturalization** *noun*
1 گوتن بە شێوەی گەرووی 2 گۆڕین بۆ دەنگی گەرووی یان پشتگەرووی، velarization ◌ گاترالیزاسیون

**gutty**[1] /ɡʌtɪ/ *noun*
(نافـەرمی و لـە سـکاتلەند و ئیرلەنـد) کەوشـی وەرزشی یان کەتانی ◌ کفش ورزشی

**gutty**[2] /ɡʌtɪ/ *adjective* (guttier, guttiest)
1 = gutsy: *a gutty quarterback* 2 دڵۆپدڵۆپ ◌ قطرەقطرە

**guv** /ɡʌv/ *abbreviation* guvnor

**guvnor** /ˈɡʌvnə(r)/ *noun*
(لە بریتانیا و نافەرمی) قوربان، بەڕێز، گەورەم، سەیدا ◌ آقا

**guy**[1] /ɡaɪ/ *noun*
1 کـابرا، پیـاو، ئینـسـان، بنیـادەم، مـرۆ 2 (guys) هەڤاڵان، دەستە رفیق، دەسـتەی هـاوەڵان ◌ 1 آدم، مرد 2 (در جمع) رفقا، دوستان

**guy**[2] /ɡaɪ/ *noun*
1 کەنـدر یـان زنجـیری راگـرتن، تـەناف یـان گوریـسی مەهار یا راگیرکردن 2 تەنافی رەشماڵ یان چادر ◌ 1 طناب مهار 2 طناب چادر

**Guyanese** /ˌɡaɪəˈniːz/ *adjective, noun*
*adj* سـەربە گویانا *n* خەڵـکی گویانا Guyana، وڵاتـێ لـە بـاکووری رۆژهـەڵاتی ئـەمریکای باشووری ◌ *adj* وابستە بە گویان *n* اهل گویان

**Guy Fawkes Day** *noun*
5ی نۆڤـامبری سـاڵی 1605 لـە ئینگلتـەرە، رۆژیـادی پووچـەڵکردنـەوەی پـیلانی گـای فاوکیس بۆ تەقاندنەوە یان تۆپبارانکردنی دوو ئەنجومەنی پارلەمان ◌ روز گای فاوکس

**Guy Fawkes night** /ˈɡaɪ fɔːks naɪt/ = Bonfire night

**guyot** /ˈɡiːəʊ/ *noun*
(زەویناسـی) کێـوی بـندەریـایی سـەرتەخت (بنەڕەت: لە ناوی زەویناس و جوگرافیـازانی سویـسی Arnold H. *Guyot* مـەرگ 1884) ◌ گیوت

**guy rope** *noun*
1 کەندر یا زنجیری راگرتن، تەناف یا گوریسی راگیرکردن یـا مـەهار 2 تـەنافی رەشـماڵ یـان چادر، گوریسی تاوڵ ◌ 1 طناب مهار 2 طناب چادر

**guyver** /ˈɡaɪvə/*noun*, also guiver, gyver
(نافـــەرمی، ئەوســـترالیا و نیوزیلەنـــد) هەڵسوکەوتی ساختە یان نەرمەبرانە ◌ رفتار ساختگی یا چاپلوسانە

**guzzler** /ˈɡʌzlə(r)/ = gas guzzler

**gybe** /dʒaɪb/ *noun*, US jibe
(کەشتی) لاگۆڕان، بادانەوە (بنەڕەت: لە *gijben* بێباوی هولەندی) ◌ تغییر جهت

**gyle** *noun*
1 ئەو برە ئاوجۆیەی کە لە جارێکدا دەنرێتەوە 2 جۆی ترشاو 2 دەفر یان جێگای ترشاندن ◌ جیل

**gym** /dʒɪm/ *noun*
1 زۆرخانە، وەرزشگا 2 ژیمناستیک ◌ 1 سالن ورزش 2 ژیمناستیک

**gymkhana** /dʒɪm'kɑːnə/ *noun*
1 پێشبڕکێی وەرزشە خۆجێییەکان ب.ت. ئەسپسواری (زۆرتر بۆ منداڵان) 2 زۆرخانە، وەرزشگا ◌ 1 ژیمکانا 2 سالن ورزش

**gymn(o)-** *prefix*
پێشگر: ڕووت، بە دەرەوە، دیار: *gymnosophist* *gymnosperm* (بنەڕەت: لە *gumnos* یۆنانییەوە "naked") ◌ پیشوند: برهنه

**gymnasial** /dʒɪm'neɪzl/ *adjective*
زۆرخانەیی، سەربە زۆرخانە یان وەرزشگا، وەرزشگایی ◌ وابسته به سالن ورزش

**gymnasium** /dʒɪm'neɪziəm/ *noun, pl.* gymnasiums or gymnasia /-zɪə/
1 وەرزشگا، زۆرخانە 2 هەروەها /gɪm'nɑːzɪəm/ خوێندنگایێ لە ئەڵمانیا، سکاندیناڤیا و ئەورووپای ناوەندی بۆ ئامادەکردنی قوتابیان بۆ زانکۆ ◌ 1 سالن ورزش 2 جیمناسیوم

**gymnast** /'dʒɪmnæst/ *noun*
ژیمناست ◌ ژیمناست

**gymnastic** /dʒɪm'næstɪk/ *adjective*, also gymnastical/dʒɪm'næstɪkl/
1 سەربە مەشق یان ڕاهێنانی لەش، وەرزشی 2 ژیمناستیکی (gymnastically *adv*) ◌ 1 ورزشی 2 وابسته به ژیمناستیک

**gymnastics** /dʒɪm'næstɪks/ *noun, pl.*
1 ژیمناستیک 2 وەرزش، ڕاهێنانی لەش ◌ 1 ژیمناستیک 2 ورزش

**gymno-** /'dʒɪmnəʊ/ *prefix*
پێشگر: ڕووت، بە دیارەوە، بەدەرەوە (بنەڕەت: لە *gumnos* یۆنانییەوە "naked") ◌ پیشوند: باز، لخت

**gymnocarpous** /ˌdʒɪmnə'kɑːpəs/ *adjective*
تۆودیار، تووڕووت، تووبەدەرەوە، میوەدیار، بەردیار ◌ برهنه میوه

**gymnopterous** *adjective*
(گیانەوەرناسی) باڵڕووت، پەڵڕووت ◌ بالبرهنه

**gymnosophist** /dʒɪm'nɒsəfɪst/ *noun*
جیمنۆسۆفیست: ئەندامی تیرەیێکی هیندوو، کە جلی زۆر کەمیان لەبەر دەکرد و خەریکی چلەکێشی و تێڕامان بوون، فیلسووفی ڕووت، ڕووتۆسۆفیست (بنەڕەت: لە *gymnosophiste* فەڕەنسی، بە ڕێگای لاتین لە *gumnosophistai* یۆنانی (کۆ plural)، لە *gumnos* "ڕووت" + *sophistēs* (بڕوانە sophist) ◌ فیلسوف برهنه

**gymnosophy** *noun*
فەلسەفەی ڕووت، ڕووتۆسۆفی ◌ فلسفه‌ی برهنه

**gymnosperm** /'dʒɪmnə(ʊ)spɜːm/ *noun*
(ڕووەکناسی) گیای تۆودیار، ڕووەکی تووڕووت، گیای تۆوڕووت، ڕووەکی تووبەدەرەوە (بڕوانە angiosperm) ◌ گیاه بازدانه

**Gymnospermae** *noun, pl.*
تۆودیارەکان، تووڕووتان، میوەڕووتەکان، تووبەدەرەوەکان ◌ بازدانگان

**gymnospermous** /-'spɜːməs/ *adjective*
تۆودیار، تووڕووت، تۆوڕووت، تووبەدەرەوە ◌ بازدانه

**gym-shoes** *noun, pl.*
کەوشی وەرزشی، پێڵاوی کەتانی ◌ کفش ورزشی

**gymslip** /'dʒɪmslɪp/ *noun*
جیمسلیپ (یەکبەرگی کچان لە خوێندنگادا) ◌ سارافون

**gyn(o)-** *prefix*
پێشگر: ژن ◌ پیشوند: زن

**gynaeceum** /dʒaɪ'niːsɪəm, US g-/*noun, pl.* gynaecea
حەرەمخانە، ئەندەروون، هوندرو (بنەڕەت: لاتین، لە یۆنانییەوە) ◌ اندرون، حرم

**gynaecic** /dʒɪ'niːsɪk, US gaɪ-/ *adjective*, US gynecic
ژنانە ◌ زنانه

**gynaecic disease** *noun*
نەخۆشی ژنانە ◌ بیماری زنانه

**gynaeco-** /'gʌɪnɪkɒ, US gʌɪ'niːkəʊ, dʒ-/ (US gyneco-) *prefix*
پێشگر: ژن، مێ، مێینە: *gynaecocracy* (بنەڕەت: لە *gunē*, *gunaik-* یۆنانییەوە "woman, female") ◌ پیشوند: زن

**-gyne** *suffix*
پاشگر: ژن، مێینە ◌ پسوند: زن

**gynecocracy** /ˌgʌɪnɪ'kɒkrəsi, US dʒ-/ *noun*
ژنفەرمانداری، ژنۆکراسی، ژنسالاری، ژنمیری ◌ زن‌سالاری

**gynaecological** /ˌgaɪnəkə'lɒdʒɪkl, US -'lɑːdʒ-/ *adjective*, US gynecological
1 سەربە پزشکێتی ژنان، پێوەندی بە پزشکیی ژنانەوە هەیە 2 سەربە نەخۆشییەکان ژن (gynaecologically *adv*) ◌ 1 وابسته به پزشکی زنان 2 وابسته به بیماری‌های زنان

**gynaecologist** /ˌgaɪnə'kɒlədʒɪst, US -'kɑːl-/ *noun*, US gynecologist
پزشکی ژنان، نۆژداری ژنان، دوکتۆری ژنان ◌ پزشک زنان

**gynaecology** /ˌgaɪnə'kɒlədʒi, US -'kɑːl-/ *noun*, US gynecology
پزشکێتی ژنان، پزشکیی ژنان: لێکۆڵینەوەیەکی زانستی چارەسەرکردنی نەخۆشی و تێکچوونەکانی کۆئەندامی زاوزێی ژنان ◌ پزشکی زنان

**gynaecophysiology** *noun*

کارەنـدامناسـی کۆئەنـدامی زاوزێـی ژنـان ۞ فیزیولوژی دستگاه تناسلی زنان

**gynandromorph** /dʒɪˈnandrəmɔːf, US ɡʌɪ-/ *noun*
(پزشکی و گیانەوەرناسی، ب.ت. مێرووەکان ) نێرەمـووکی، دووڕەگـەزی، نەنێرنـەمێوی، نێرمێ(ـو)شێوە، زیندەوەر یان بوونەوەرێ کە بەشێکی لەشی نێرە و بەشێکی تری مێ ۞ دوجنسه

**gynandromorphic** *adjective*
سـەربە نێرەمـووکی یـان دووڕەگـەزی یـان نەنێرنەمێوی ۞ وابسته به دوجنسه

**gynandromorphism** *noun*
نێرەمـووکی، دووڕەگـەزی، نەنێرنـەمێوی ۞ دوجنسه

**gynandromorphous** /dʒɪnandrəˈmɔːfəs, US ɡʌɪ-/ *adjective*
نێرەمووک، دووڕەگەزە، نەنێرنەمێو، هەرمک ۞ نرماده

**gynandromorphy** *noun*
نێرەمـووکی، دووڕەگـەزی، نەنێرنـەمێوی ۞ دوجنسه

**gynandrous** /dʒɪˈnandrəs, US ɡʌɪ-/ *adjective*
1 (ڕووەکناسـی، گـوڵ) هـەم نێـرک و هـەم نێرەکەی هەیێ، جووتـە، نێرومێ 2 نێرەمووک، دووڕەگـەز، نەنێرنـەمێو ۞ 1 مـزدوج 2 نرمـاده، دوجنسه

**gynaephobia** /ˌɡʌɪnə(ʊ)ˈfəʊbɪə, US ˌdʒʌɪ-/ *noun*
ژنۆفۆبیا، ژنترسی ۞ زنهراسی

**gynarchy** /ˈɡʌɪnɑːki, US ˈdʒʌɪ-/ *noun, pl.* gynarchies
ژنسـالاری، ژنمـیری، دەسـەڵاتداریتی ژنـان ۞ زنسالاری

**gyneco-** US spelling of gynaeco-

**gyniolatry** *noun*
ژنپەرستی ۞ زنپرستی

**gynocentric** /ˌɡʌɪnə(ʊ)ˈsɛntrɪk, US ˌdʒʌɪ-/ *adjective*
ژنتەوەر، ژنناوەند ۞ زنمحور

**gynocracy** = gynaecocracy

**gynoecium** /ɡʌɪˈniːsɪəm, US dʒ-/ *noun, pl.* gynoecia /-sɪə/
نێرک، کورۆک، مێوتک، مێتک، مێئەندامی گوڵ، نێرکان، کۆمەڵەی نێرکە، مێتکخانە (بنەڕەت: لاتینی نوێ، لە *gunaikeion* یۆنانی "باڵاخانەی ژنان"، لە *gunaik-*, *gunē* "ژنان، مێ" + *oikos* "خانە") ۞ عضو ماده در گل، مجموعەی مادگی

**gynophobia** /ˌɡʌɪnə(ʊ)ˈfəʊbɪə, ˌdʒʌɪ-/ *noun*
ترسێکی یەکجار لە ژن، لەژنترسی ۞ زنهراسی

**gynophobic** *adjective*
لەژنترس، تۆقیو لە ژنان ۞ زنهراس

**gynophore** /dʒɪnəfəʊ(r)/ *noun*
لاسکی نێرکە، نێرکەبەر، نێرکەهەڵگر ۞ ساقەی تخمدان

**-gynous** *suffix*
پاشـگر: خـاوەنی جـۆرێکی تایبـەتی ئەندامـە مێینـەکان یـا نێرکـەیێ: *epigynous* (بنـەڕەت: لـەسـەر بنچینـەی *gynus*- لاتـین، لـە *-gunos* یۆنانی، لە *gunē* "ژن") ۞ پسوند: دارای عضو مادگی خاص یا مادگی

**gyp**[1] /dʒɪp/ *noun*
(تافەرمی و بریتانیا) ئازار، ژان، ئێش ۞ عذاب، درد

**gyp**[2] /dʒɪp/ *noun*
گوێبڕی، لەخشتەبردن، swindle ۞ گولزنی

**gyp**[3] /dʒɪp/ *noun*
نۆکەر یان بەردەستی کۆلێژ، کارەکەری کۆلێژ (زانکۆکانی کەمبریج و دورهام) ۞ خدمتکار دانشکده

**gyppo** /ˈdʒɪpəʊ/ *noun,* also gippo
(تافەرمی، سووکانە) قەرەچی ۞ کولی

**gypseous** /ˈdʒɪpsɪəs/ *adjective*
گەچی، شێوەی پێکهاتوو لە گەچ، گەچ دەدا، گەچدار، گەچاوی، گەچی تیایە: *gypseous clay loam* ۞ گچی، متشکل از گچ، گچدار

**gypsiferous** /-ˈsɪf(ə)rəs/ *adjective*
گەچئاسا، شێوەگەچ، گەچی، گەچەلان، گەچدار، گەچاوی ۞ گچمانند، گچخیز

**gypsophila** /dʒɪpˈsɒfɪlə/ *noun*
(ڕووەکناسی) گەچەحەزە؟، بابردەلە؟ [توخم *Gypsophila*] ۞ رقیقه

**gypsum** /ˈdʒɪpsəm/ *noun*
1 گەچ، بەردی گەچ، بەردەگەچ 2 = drywall (بنەڕەت: لە لاتینەوە، لە *gupsos* یۆنانییەوە) ۞ گچ، سنگ گچ

**gypsy** /ˈdʒɪpsi/ *noun* (*pl.* gypsies), *adjective,* also gipsy
*n* 1 کـاولی، دۆم، قەرەچـی، نـەوەر، جنگانـە 2 زمانی دۆمان *adj* سەربە دۆمەکان ۞ *n* 1 کولی 2 زبان کولی *adj* وابسته به کولیها

**gypsy moth** *noun*
جۆری پەپوولەی (شەوگەڕ moth)ی نێرقاوەیی و مێبێباڵی سپی و گەورەتر [ *Lymantria dispar*] ۞ نوعی پروانه

**gypsywort** *noun*
گیادۆمە؟ (دەڵێن دۆمەکان بۆ ڕەنگاندنی پێستیان بەکاریان دێنا)، گیایێکی گوڵسپی لە تیرەی mint، هی بووی شێدار [*Lycopus europaeus*] ۞ نوعی گیاه

**gyr(o)-** *prefix*

پێشگر: 1 گەڕان، سووڕان، خولانەوە، سەربە خولانەوە، سووڕانەوەی، ئاڵقە، بازنە: *gyromagnetic* 2 سەربە سووڕانبینی یان ژیرۆسکۆپ: *gyrostabilizer* (بنەڕەت: لە *guros* یۆنانییەوە "a ring") ○ پێشوند: 1 گردش، وابسته به گردش، دایره، حلقه 2 وابسته به ژیروسکوپ

**gyral** /ˈdʒʌɪr(ə)l/ *adjective*
وەرسووڕ، گەڕۆک، خولۆک، گەڕندە ○ گردنده

**gyrate** /ˈdʒaɪreɪt, US ˈdʒaɪreɪt/ *adjective*
ئاڵقەیی، بازنەیی، وەرسووڕ، گەڕندە، گەڕۆک ○ حلقه‌ای، گردنده

**gyrating** *adjective*
سووڕۆک، وەرسووڕ، گەڕۆک، خولۆک، دەورسووڕ (بە دەور شتێکدا) ○ دوار

**gyration** /dʒaɪˈreɪʃn/ *noun*
سووڕان، خولان، خولانەوە، چەرخین، دەورلێدان، گەڕان، چەرخخواردن، گردوخول، سووڕخواردن، چەرخ (بە دەور خاڵ یان تەوەردا): *The butterflies were performing the gyration of the* ◊ *aerial gyrations earth on its axis* ○ چرخش، گردش

**gyrator** *noun*
وەرچەرخ، وەرسووڕ، سووڕۆک، گەڕندە، گەڕۆک ○ چرخنده

**gyratory** /dʒʌɪˈreɪt(ə)ri, US ˈdʒʌɪrət-/ *adjective, noun* (*pl.* gyratories)
*adj* سووڕۆک، وەرسووڕ، خولۆک، دەورسووڕ، گەڕۆک، دەگەڕێ، چەرخی، دەورلێدەر *n* (gyratories) سیستمێکی هاتوچۆیی کە پێویستە دەور لێدرێ ○ *adj* دوار، گردنده *n* (در جمع) یک سیستم ترافیکی

**gyre** /ˈdʒʌɪə, US ˈgʌɪə/ *noun*
1 ئاڵقە، بازنە 2 جوولەی بازنەیی، گێژاو، بزاوت یان جوولانی ئاڵقەیی، شێوە یان جوولانی پێچلوولی spiral 3 (جوگرافی) جۆرێ پاتێرنی ئاڵقەیی یان سووڕی تەوژمەکان لە تەرکی ئۆقیانووسدا؛ سیستمێکی ئاڵقەیی تەوژمەکانی ئۆقیانووسی کە لە نیوەگۆی Hemisphere باکووریدا راستسووڕ و لە نیوەگۆی باشووریدا چەپسووڕە (gyral *adj*) counterclockwise ○ 1 حلقه، دایره 2 حرکت دایره‌ای 3 جایر

**gyrfalcon** /ˈdʒəːˌfɔː(l)k(ə)n, US -ˌfɒlk(ə)n/ *noun*
(باڵندەناسی) سەنقور، شمقار، بە چەندین رەنگی هەیە [*Falco rusticolus*] ○ سنقر

**gyri** = plural form of gyrus

**gyro**, *pl.* gyros = gyrocompa, gyroscope

**gyrocompass** *noun*
لادۆز یان رووگەدۆزی ژیرۆسکۆپی ○ قطب‌نمای ژیروسکوپی

**gyromagnetic** *adjective*
(فیزیک) سەربە تایبەتمەندی مەگناتیسی یان میکانیکی پارچۆلکە یا تەنێکی ئێلیکتریکی وەرسووڕ ○ ژیرومگناتیک

**gyron** /ˈdʒʌɪr(ə)n/ *noun*
(heraldry) تیرۆژوو(ک؛ بنەڕەت: لە فەرەنسی کۆنەوە "gusset") ○ جیرون

**gyronny** /dʒʌɪˈrɒni/ *adjective*
(heraldry) دابەش کراوە بەسەر هەشت تیرۆژوو(ک، مەتاڵ) ○ جیرونی

**gyropilot** = automatic pilot

**gyroplane** = autogiro

**gyroscope** /ˈdʒaɪrəskəʊp, US -skoʊp/ *noun*
سووڕانبین، ژیرۆسکۆپ (دەزگایێ بۆ راگرتنی هاوسەنگی و لەنگەری کەشتی و فڕۆکە) ○ گردش‌نما، ژیروسکوپ

**gyroscopic** /ˌdʒaɪrəˈskɒpɪk, US -ˈskɑːpɪk/ *adjective*
سەربە سووڕانبینی، سەربە یان پێوەندی بە ژیرۆسکۆپەوە هەیە (gyroscopically *adv*) ○ وابسته به ژیروسکوپی

**gyroscopic compass** *noun*
لادۆز یان رووگەدۆزی ژیرۆسکۆپی ○ قطب‌نمای ژیروسکوپی

**gyrostabilizer** *noun,* also gyroscopic stabilizer or gyrostat
دەزگایێکی ژیرۆسکۆپی بۆ راگرتنی لەنگەر یا هاوسەنگی کەشتی، فڕۆکە، سەکۆ platform و هتد ○ ژیرواستابیلیزر

**gyrus** /ˈdʒʌɪrəs/ *noun, pl.* gyri /-rʌɪ/
(توێکاری) قەد یان قەفی سەر مێشکۆلە، چینی مێشکۆلە ○ جیروس

**Gy Sgt** = *abbreviation* Gunnery Sergeant

**gytja** /ˈjɪtʃə/ *noun*
(زەویناسی) لیتەک: نیشتوویێ پڕ لە ماک و مەتریالی ئەندامی organic matter لە بنکی گۆماو یان دەریاچەیێکی پڕخۆراکدا eutrophic (بنەڕەت: لە سویدییەوە بە واتای "لیتە، قوڕ، ooze ،mud") ○ جیتجا

**gyves** /dʒʌɪvz, US gʌɪvz/ *noun*
کۆتوزنجیر، پێوەن(د)، کۆتوبەند (gyved *adj*) ○ غل و زنجیر

**gyver** = guyver

# H h

**H**[1], **h** /eɪtʃ, *pl.* Hs, H's, h's /ˈeɪtʃɪz/ *noun*
1 ئێیچ، ئەیچ (= هەشتەمین پیتی ئەلفوبێی ئینگلیسی) 2 ئاماژە بە دەنگێ دوای G لە دەستەیێ لە شتەکان، بابەتەکان و هتد 3 شتێک لە شێوەی پیتی H ۞ 1 و 2 ایچ 3 چیزی به شکل حرف H
**H**[2] *abbreviation* 1 (of a pencil lead) hard 2 height 3 Physics henry(s) 4 informal heroin 5 Brit. (on street signs) hydrant 6 symb. the chemical element hydrogen 7 Chemistry enthalpy
**h** *abbreviation* 1 (بۆ پێوانی بەرزایی ئەسپ) hand(s) 2 hecto- 3 horse 4 hot 5 hour(s)
**ha**[1] /hɑː/ *interjection*
*Ha! I knew he was hiding something* :ئا! ها! ئەها!! ۞ هان!
**ha**[2] *abbreviation* hectare(s)
**haaf** /hɑːf, haf/ *noun*
(لە ئۆرکنێی Orkney و شێتلەند Shetland) ناوچە یان شوێنێ لە دەریا کە بۆ راوەماسی بەکاردێنرا (بنەڕەت: لە *haf* نۆرسی کۆن "دەریای بەرز") ۞ هاف
**haar** /hɑːr/ *noun*
تەم یان مژێکی ساردی دەریا، هی کەناری رۆژهەلاتی ئینگلتەرە و سکاتلەند (بنەڕەت: رەنگە لە *hárr* نۆرسی کۆن "hoary ,hoar") ۞ هار
**Hab.** = *abbreviation* Habakkuk
**Habakkuk** *noun*, also Habacuc, Hebrew *Hăbhaqqūq*
1 هاباکوک، حەبقووق: پێغەمبەرێکی عیبری سەدەی حەوتەمی بەرلە زایین 2 کتێبی حەبقووقی پێغەمبەر ۞ 1 حبقوق 2 کتاب حبقوق نبی
**habanera** /ˌhabəˈnɛːrə, US ˌɑːbə-/ *noun*, *pl.* habaneras
هەڵپەڕکێ یان مۆسیقای کوبایی (بنەڕەت: کورتکراوەی *danza habanera* سپانیایی "سەما یا هەڵپەڕکێی هاڤانا Havana") ۞ هابانرا
**Habanero** – North American term for Scotch bonnet
**Habdalah** /havˈdɑːlə/ *noun*, also Havdala
هەڤدالا، هابدالا (= نوێژ یان رێورەسمێکی جوولەکان، کۆتایی Sabbath بەڕێوەدەچێ، بنەڕەت: لە *habdālāh* عیبری "separation", "division") ۞ هابدالا
**habeas corpus** /ˌheɪbiəs ˈkɔːpəs, US ˈkɔːrpəs/ *noun*, Latin
(ماف) دەستووری بانگکردن (زیندانی) بۆ دادگا (بە مەبەستی لێکۆڵینەوە و مانەوەی لە زیندان یان نا) ۞ حکم احضار به دادگاه
**habeas corpus ad subjiciendum** *noun*, Latin
(ماف) دەستووری بۆ لێکۆڵینەوەی گرتنی تاوانبارێ بۆ دادگا ۞ حکم رسیدگی به علت جلب متهمی به دادگاه
**haberdasher** /ˈhæbədæʃə(r), US ˈhæbərd-/ *noun*
دروومانەفرۆش، وردەفرۆش، مەتوموورووفرۆش ۞ خرازی‌فروش
**haberdashery** /ˌhæbəˈdæʃəri, US ˈhæbərd-/ *noun*, *pl.* haberdasheries
1 دروومانەفرۆش، دووکانی مەتوموورووفرۆشی، دووکانی کەلوپەلی دروومان، مالی بەرگدروون، وردەفرۆشی 2 دووکان یان بەشێکی گەورە لە

فرۆشگەیێ کە شتومەکی پیاوانە دەفرۆشێ ◌ 1 خرازی‌فروشی 2 هابردشری

**habergeon** /ˈhabədʒ(ə)n, US həˈbɔːdʒ(ə)n/ *noun*
1 (مێژوویی) زریی بێ‌قۆڵ 2 = hauberk ◌ جوشن بی‌آستین

**Haber process** *noun*
ڕەوت یان پرۆسەی هابێر: ڕەوت یان پرۆسەیێکی تاودەرانە catalytic بۆ پێکهێنانی ئامۆنیا ammonia لە نایترۆژێن و هایدرۆژێن (بنەڕەت: لە ناوی کیمیازانی ئەڵمانی Fritz Haber (1868-1934) ◌ فرایند هابر

**habile** /hæbɪl/ *adjective*
شارەزا، کارزان، لێزان ◌ ماهر، خبره

**habiliment** /həˈbɪlɪm(ə)nt/ *noun*
1 جل‌وبەرگ، بەرگ، جامە، کنج، جل 2 (habiliments) کەل‌وپەل، تروتفاق، تیشواک، شتومەک، accouterments، trappings: *the habiliments of civilization* — W. P. Webb ◌ 1 جامە، پوشاک 2 (در جمع) تجهیزات

**habit** /ˈhæbɪt/ *noun*
1 خوو، پیشە، عادەت، ڕاهات؟، سان، خوو و خدە: *good/bad habits* 2 دەستوور، ڕەوشت، هەڵسوکەوتی هەمیشەیی، سان، داب، کەفنەشۆپ، ڕێ‌وشوێن 3 گیرۆدەیی، ئالوودەیی، فێربوون 4 عابا، باڵاپۆش، خەرقە ◌ 1 عادت، خلق و خو 2 رسم 3 اعتیاد 4 خرقه

**habitability** /hæbɪtəˈbɪlɪti/ *noun*, also habitableness
لەلێ‌مانەوەهاتوویی، ژیان‌لێ‌کراوی، لەنیشتەجێ‌هاتوویی ◌ سکونت‌پذیری

**habitable** /ˈhæbɪtəbl/ *adjective*
ژیان‌لێ‌کراو، لەنیشتەجێ‌هاتوو، جێی‌ژیوار، شیاوی لێ‌مانەوە، لەدانیشتن‌هاتوو، ژیانی لێ‌دەکرێ، بۆ دانیشتن دەبێ، بۆ گیرسانەوە دەبێ: *The house should be habitable by the new year* ◌ سکونت‌پذیر

**habitably** /ˈhæbɪtəbli/ *adverb*
لەنیشتەجێ‌هاتووانە ◌ بە طور قابل سکونت

**habitance** /ˈhæbɪtəns/ *noun*
لێ‌مانەوە، نیشتەجێ‌بوون، لێ‌دانیشتن، گیرسانەوە، ژیوارکردن ◌ سکونت

**habitant** /ˈhæbɪtənt/ *noun*
1 دانیشتوو، جێوار، لێ‌ماوە 2 /abiːˈtɒ̃/ فەرەنسی کەنەدانشین، ب.ت. Quebec یان Louisiana ◌ 1 ساکن 2 هابیتانت

**habitat** /ˈhæbɪtæt/ *noun*
ژیوارگە، خۆجێ، بوو، جێوار، ژینار، ژینگە، زێد، بنەجێ، جێی سروشتی، شوێنی خۆرسک: *the destruction of wildlife habitat* ◊ *The panda's natural habitat is the bamboo forest* ◌ بوم، سکونتگاه

**habitation** /ˌhæbɪˈteɪʃn/ *noun*
1 لێ‌مانەوە، لێ‌دانیشتن، نیشتەجێ‌بوون، گیرسانەوە، ژیوارکردن: *They looked around for any signs of habitation* 2 ماڵ، خانوو، شوێنی گیرسانەوە، ئەولەگا، یۆرگە ◌ 1 سکونت 2 مسکن

**habit-forming** *adjective*
خوویێگر، گیرۆداوی، گیرۆدەکەر، گیرۆدەساز ◌ اعتیادآور

**habitual** /həˈbɪtʃuəl/ *adjective*
1 ئاسایی، هەمیشەیی، عەدەتی 2 گیرۆدە، ڕاهاتوو، عادەت‌کردوو، خدەگرتوو، فێر 3 لە ڕووی عادەتەوە، واخووگرتوو، واڕاهاتوو ◌ 1 عادی 2 معتاد 3 ناشی از عادت

**habitual drunkard** *noun*
هەمیشەمەست، دایمەمەست ◌ دائم‌الخَمر

**habitually** /həˈbɪtʃuəli/ *adverb*
وەکوو هەمیشە، وەکوو جاران، لە ڕووی عادەتەوە، لە ڕووی خووەوە: *he -ually wore the dark glasses* ◌ طبق معمول، برحسب عادت

**habituation** /həbɪtʃuˈeɪʃn/ *noun*
خووپێ‌گرتن، عادەت‌پێ‌دان، پێ‌کردنەپیشە، داهێنان، گیرۆدەکردن، فێرکردن، پێوەکردن، خووگرتن، داهاتن، ڕاهاتن، عادەت‌گرتن ◌ عادت‌دهی، معتادسازی، اعتیاد

**habitude** /ˈhæbɪtjuːd/ *noun*
دەستوور، ڕەسم، داب، شێوە، ڕەوشت، خوو و خدە، ڕێ‌وشوێن ◌ رسم، منش، خصلت، روش

**habitué** /(h)æˈbɪtʃueɪ/ *noun*, also ha£bi£tue
(لە فەرەنسەوە) هات‌وچۆکەر یان سەرداندچی هەمیشەیی، هەمیشە لە هات‌وچۆدا، گیرۆدە، خووگرتوو ◌ پای ثابت، معتاد

**hachures** /haˈʃjʊəz/ *noun, pl.* also hachure
هاشوور (hachured *adj*) ◌ پرداز

**hacienda** /ˌhæsɪˈendə/ *noun*
(لە وڵاتانی سپانیایی‌زماندا) شامووچە، مووچەوبەرە، مووچەگەورە، گەورەکێڵگە، مووچەی گەورە (بە ماڵیکەوە) ◌ مزرعه یا کشت‌زار بزرگ

**hack**[1] /hæk/ *noun*
1 لەقە، شەق، پێلەقە، شەپ 2 قولینگی دووسەر یان کان‌کەنی، پاچی دووسەر 3 بێل، پێمەرە 4 (کۆن) برین 5 کوخەی وشک (و کورت) 6 (کامپیوتێر) هەک (بنەڕەتی ئەڵمانیای ڕۆژاوای هەیە) ◌ 1 لگد، تیپا 2 کلنگ دوسر 3 بیل 4 زخم 5 سرفەی خشک 6 هک

**hack**[2] /hæk/ *noun*
1 نووسەری بەکرێ‌گیراو یان مزەوەر، نووسەری ڕاسپاردە(کار) 2 فشە (یان کەچە) سیاسەتوان، سیاسەتوانی ناگرنگ و هیچ 3 دزی کامپیوتێری،

دزه‌گه‌ری، هه‌ک 4 ئه‌سپی به‌کرێ 5 که‌لاکه‌ئه‌سپ یان پیره‌ئه‌سپی له‌پێ‌که‌وتوو 6 سواری ئه‌سپ، ئه‌سپ‌سواری 7 شۆفێری تاکسی 8 تاکسی ◌ 1 نویسنده‌ی مزدور 2 سیاست‌مدار الکی 3 سرقت کامپیوتری 4 اسب کرایه‌ای 5 اسب ازپاافتاده و پیر 6 اسب‌سواری 7 راننده‌ی تاکسی 8 تاکسی

**hackamore** /ˈhakəmɔː/ *noun*

له‌غاو یان ده‌م‌بێنێ بۆ راهێنانی ئه‌سپ ◌ هکمور

**hackberry** *noun, pl.* hackberries

1 دارێکی گه‌لاگه‌زنه‌یی [*Celtis occidentalis* (ئه‌مریکای باکووری) و جۆره‌کانی تر] 2 به‌ری ئه‌رخه‌وانی ئه‌و داره ◌ داغداغان

**hackbut** /ˈhækbʌt/ *noun*, also hagbut

جۆرێ قرمه که بنی قونداخه‌که‌ی چه‌مابێوه ◌ نوعی شمخال

**hacked off** *adjective*

زیز، زویر، ناره‌حه‌ت، رق‌هه‌ستاو: - *I'm really d off* ◌ دلخور، عصبانی

**hacker** /ˈhækə(r)/ *noun*

خولیای کامپیوتێر، چه‌ته‌ی کامپیوتێری ◌ هکر

**hack-hammer** /ˈhæk hæmə(r)/ *noun*

چه‌کوشی ته‌شوێ‌ئاسای به‌ردتاشان ◌ نوعی چکش

**hacking** *noun*

دزی(کـردن) کامپیوتێری، چه‌ته‌گه‌ری کامپیوتێری ◌ هکینگ

**hacking cough** *noun*

کوخه‌ره‌شه، کوخه‌وشکه ◌ سرفه‌ی خشک

**hacking jacket** *noun*

چاکه‌ت یا که‌وای ئه‌سپ‌سواری ◌ کت سوارکاری

**hackles** /ˈhæklz/ *noun*

1 به‌ر یان تووکی ملی باڵنده و گیانه‌وه‌ره‌کان (وه‌کوو پشیله، سه‌گ، که‌ڵه‌شێر و هتد) 2 (make someone's hackles rise) تووره‌کردن، کفرده‌رهێنان، رق هه‌ستاندن، له دین ده‌رکردن ◌ 1 پر یا موی گردن پرندگان و حیوانات 2 عصبانی‌سازی

**hackman** /ˈhækmən/ *noun, pl.* hackmen

ئه‌رابه‌وانی به‌کرێ ◌ راننده‌ی درشکه‌ی کرایه‌ای

**hackney** /ˈhækni/ *noun, pl.* hackneys

1 سواری ئه‌سپ، ئه‌سپ‌سواری، غاره‌ئه‌سپ 2 ئه‌سپی کالیسکه‌کێش 3 کالیسکه‌ی به‌کرێ ◌ 1 اسب‌سواری 2 اسب درشکه 3 درشکه‌ی کرایه‌ای

**hackney carriage** /ˈhækni kærɪdʒ/ *noun*, also hackney cab

1 کالیسکه‌ی به‌کرێ (جاران له‌جیاتی تاکسی به‌کاردێترا) 2 تاکسی ◌ 1 درشکه‌ی کرایه‌ای 2 تاکسی

**hackneyed** /ˈhæknid/ *adjective*

کۆن، له‌باوکه‌وتوو، رزیو، پوواو، سوواو، شر، شه‌که‌تکه‌ر: *a hackneyed phrase/subject* ◌ قدیمی، پیش‌پاافتاده، لوس، خسته‌کننده

**hacksaw** /ˈhæksɔː/ *noun*

مشار یان هه‌ره‌ی ئاسن‌بڕ، مشاری که‌وانی، هه‌ره‌ی که‌وانه، که‌وانه‌هه‌ره ◌ اره‌ی آهن‌بر

**hackwork** *noun*

1 به‌رهه‌می وێژه‌یی یان هونه‌ری 2 کاری گیان‌ده‌رهاتن یان پشت‌شکێن، کوله‌مه‌رگی ◌ 1 اثر ادبی یا هنری 2 کار گل

**had** /hæd/ = past and past participle of have

**haddock** /ˈhædək/ *noun, pl.* same

هه‌داک (ماسی ئاسایی بۆ خواردن به‌کاردێترێ [*Melanogrammus aeglefinus*]): *smoked haddock* ◌ هداک

**hade** /heɪd/ *noun*

(زه‌وی‌ناسی) لاری، لێژی، خواری ◌ میل، کجی

**Hadean** *adjective*

(زه‌وی‌ناسی) سه‌ربه کۆسه‌رده‌مانی aeon مێژوو نێوان پێکهاتنی کۆمه‌ڵه‌ی خۆری و یه‌که‌مین که‌ڤر و به‌ردی سه‌ر زه‌وی ◌ هادئان

**Hades** /ˈheɪdiːz/ *noun*, also underworld, Greek *Aidēs, Āidēs, Haidēs*

1 دۆزه، جیهانی خوارین، جیهانی مردووان یان گیانان (میتۆلۆژی یۆنانی، بنه‌ڕه‌ت: له *Haidēs* ناوی Pluto، خودای مردووان) 2 (نافه‌رمی) جه‌هه‌نه‌م، دۆزه‌خ، Sheol ◌ 1 عالم ارواح 2 (عامیانه) جهنم

**Hadith** /hæˈdiːθ/ *noun, pl.* Hadith ro Hadiths

فه‌رمووده، حه‌دیس (بنه‌ڕه‌ت: له *ḥadīṯ* عه‌ره‌بی "tradition") ◌ حدیث

**hadj** /ˈhædʒ/ *noun*

حه‌ج ◌ حج

**hadji** /ˈhædʒɪ/ *noun*

حاجی ◌ حاجی

**hadn't** /ˈhædnt/ *abbreviation* had not

**hadron** /ˈhadrɒn/ *noun*

(فیزیک) پارچۆلکه‌یه‌کی زێرگه‌ردیله‌یی (وه‌ک پرۆتۆن و نۆترۆن) که له کوارک پێکهاتووه و ده‌توانی له کارلێکی به‌هێزدا به‌شداری بکا، وه‌ک باریۆن baryon یان میزۆن meson ◌ هادرون

**hadronic** *adjective*

سه‌ربه هادرۆن ◌ وابسته به هادرون

**hadrosaur** /ˈhadrəsɔː/ *noun*

ئه‌ستووره(مار)مێلکه، هادرۆسۆر: دایناسۆرێکی زۆرتر دووپێی گیاخۆر، خێزانی Hadrosauridae، شه‌ویلکه‌ی ته‌خت وه‌کوو ده‌نووکی مراوی (بنه‌ڕه‌ت: له *hadros* یۆنانی "ئه‌ستوور" + *sauros* "مارمێلک") ◌ هادروسور

**hadst** = archaic second person singular past of have

**haecceity** /hɛkˈsiːɪti, US hiːk-/ *noun*

خــــوێن‌پێکهێنــــان، دروس‌کــــردنی خــــوێن، خوێن‌هەڵێنان ۞ خون‌زایی

**haematogenous** /ˌhiːməˈtɒdʒɪnəs/ *adjective*, US haematogenous

(پزشکی) 1 خوێن‌ساز، خوێن‌پێکهێن 2 لە خوێن پێکهــاتوو، بــەهــۆی خــوێن بــڵاوەبــوو: 1 ۞ *haematogenous spread of infection* خون‌زا 2 از خون به وجود آمده، هماتوژنوس

**haemotoid** *adjective*, US hemotoid

وەکوو خوێن، خوێن‌ئاسا، شێوەخوێن ۞ خون‌وار

**haematological** /ˌhiːmətəˈlɒdʒɪkl, US -ˈlɑːdʒ-/ *adjective*, US hematological

سەربە یان پێوەندی بە خوێن‌ناسی‌یەوە هەیە ۞ خون‌شناختی

**haematologist** /ˌhiːməˈtɒlədʒɪst, US -ˈtɑːl-/ *noun*, US hematologist

خــوێن‌نــاس، پــسپۆری خــوێن، خوێنــەوان ۞ خون‌شناس

**haematology** /ˌhiːməˈtɒlədʒi, US -ˈtɑːl-/ *noun*, US hematology

خــــوێن‌ناســــی، خوێنــــەوانی، لێکۆڵــــینەوەی فیزیۆلۆژی خوێن ۞ خون‌شناسی

**haematoma** /ˌhiːməˈtəʊmə, US -ˈtoʊmə/ *noun*, *pl.* haematomas or haematomata /-mətə/, US hematoma

کوانی خوێنی، دمەڵی خوێنی، وەرەمی خوێنی ۞ دمل خونی

**haematophagous** /ˌhiːməˈtɒfəgəs/ *adjective*, US hematophagous

(گیانەوەرناسی) خوێن‌خۆر ۞ خون‌خوار

**haematopoiesis** /ˌhiːmatə(ʊ)pɔɪˈiːsɪs/ US hematopoiesis = haemopoiesis (haematopoietic *adj*)

**haematose** *adjective*, US hematose

پڕخوێن ۞ پرخون

**haematoxylin** /ˌhiːməˈtɒksɪlɪn/ *noun*, US hematoxylin

خوێن(بە)دارە: ئاوێتەیێکی فینۆلیکی کریستاڵی بێ‌ڕەنگی $C_{16}H_{14}O_6$ نێو logwood کە بە ئاسانی دەگۆڕدرێ بۆ ڕەنگەکان و لە بواری ستەیــنی بــایۆلۆژیکی بــەکــاردێترێ (لــە *Haematoxylum* لاتینی نوێ (ناوی تــوخم؛ بنەڕەت: لە -haemato + *xulon* یۆنانی "دار") ۞ هماتوکسیلن

**haematuria** /ˌhiːməˈtjʊərɪə/ *noun*, US hematuria

بوونی خوێن لە میزدا، هێماتۆریا ۞ هماتوریا

**haematozoon** /hemətəˈzəʊɒn/ *noun*, US hematozoon

مشەخۆری خوێن ۞ انگل خون

**-haemia** = variant spelling of -aemia

تاکێتی، کێیەتی، تاک، کەسێتی ۞ فردیت، فرد، شخصیت

**haem(o)-** / ˈhiːməʊ, US -moʊ/ *prefix*

پێشگر: خــوێن، خــێن (بنــەڕەت: لــە *haima* *haimat* یۆنانی‌یەوە "خوێن") ۞ پیشوند: خون

**haem** /ˈhiːm/ *noun*, US heme

(زیندەکیمیا) ئاوێتەیێکی ئاسن‌دار لە دەستەی porphyrin کــە بــەشــی نــاپرۆتێینی prosthetic haemoglobin پێکدێنێ، کۆمەڵی ئاســـن‌داری ســـوور $C_{34}H_{32}N_4O_4Fe$ ی هێمۆگلۆبین و myoglobin ۞ هیم

**haemal** /ˈhiːm(ə)l/ *adjective*, US hemal

خوێنی، سەربە خوێن ۞ خونی

**haemangioma** = angioma

**haemapoiesis** *noun*

خوێن‌پێکهاتن، دروس‌بوونی خوێن، خوێن‌سازی ۞ خون‌زایی

**haemapoietic** *adjective*

خوێن‌پێکهێن، خوێن‌دروسکەر، خوێن‌ساز ۞ خون‌ساز

**haemat(o)-** US hemato- *prefix*

پێشگر: خوێن، خێن: *haematoma* (بنەڕەت: *haima* -*haimat* یۆنانی‌یەوە "خوێن "blood) ۞ پیشوند: خون

**haematemesis** /hiːməˈtemɪsɪs/ *noun*

ڕشانەوەی خوێن، خوێن‌هێنانەوە ۞ استفراغ خون

**haematic** /hɪˈmætɪk/ *adjective*

خوێنی، خوێن‌دار ۞ خونی، دارای خون

**haematin** /ˈhiːmətɪn/ *noun*, US hematin

(زینــدەکیمیــا) هیمــاتین: ئاوێتــەیــی $C_{34}H_{33}N_4O_5Fe$ کە لە هێمۆگلۆبین بەرهەم دێنرێ ۞ هماتین

**haematite** /ˈhiːmətaɪt/ *noun*, US hematite

هیمێتایت، بەردەخوێن، بەردی ئاسن (بەردێکی سووری تاریک کە ئاسن لەو بەدەست دێ؛ (haematitic *adj* ۞ همتایت

**haematocele** /ˈhiːmətə(ʊ)siːl/ *noun*, US hematocele

(پزشکی) دمەڵی خوێنی، کوانی خوێنی ۞ دمل خونی

**haematocrit** /ˈhiːmətə(ʊ)krɪt/ *noun*, US hematocrit

(کارتــەنــدامناســی) 1 ڕێــژەی بــوونی خڕۆکــە سوورەکانی خوێن سەبارەت بە سەرجەم ڕێژەی خــوێن 2 ســێنتریفیوژێ بــۆ جیاکردنــەوەی خانەکانی خوێن لە پلازما ۞ هماتوکریت

**haematogen** *noun*, US hematogen

خوێن‌پێکهێن، خوێن‌ساز، دروسکەری خوێن، خوێن‌هەڵێن ۞ خون‌زا

**haematogenesis** /hemətəʊˈdʒenɪsɪs/ *noun*, US hematogenesis

**haemic** /'hi:mɪk/ *adjective*, US hemic
سەربە خوێن، خوێنی ◌ وابستە بە خون، خونی

**haemo-** (US hemo) = equivalent to haemato- (from Gk *haima* 'blood')

**haemochromatosis** /ˌhi:mə(ʊ)ˌkrəʊmə'təʊsɪs/ *noun*, US hemochromatosis, also bronze diabetes or iron-storage disease
(پزشکی) کێشەیێکی بۆماوەیی میتابۆلیزمی ئاسن کە لەودا ڕەنگ و پیگمێنتە ئاسنداره‌کان لە شانەکاندا دەنیشن ◌ هموکروماتوز

**haemochromatotic** *adjective*
سەربە هیمۆکرۆماتۆسیس یان کرۆماتۆز ◌ هموکروماتوتیک

**haemocoel** /'hi:məsi:l/ *noun*, US hemocoel
(گیانەوەرناسی) خوێنەبۆشە: بۆشاییێکی لەش (وەک هی جومگەپایان و هێندێ لە لەشنەرمان) کە خوێن و haemolymph ی تیایە و وەک بەشێ لە سیستمی سووڕانی خوێن کار دەکا ◌ حفرەی خونی، هموسیل

**haemocyanin** /ˌhi:mə(ʊ)'sʌɪənɪn/ *noun*, US haemocyanin
(زیندەکیمیا) پرۆتێینێ کە مسی تیایە، بەرپرسی ڕاگوێستنی ئۆکسیژێنە لە پلازمای خوێنی جومگەپایان و لەشنەرمان ◌ هموسیانین

**haemocyte** *noun*, US hemocyte
خانەی خوێنی، خوێنخانە، blood cell. ب.ت. هی گیانەوەرێکی بێبڕبڕە invertebrate ◌ سلول خونی

**haemocytometer** *noun*, US hemocytometer
خوێنخانەژمێر، خانەخوێنژمێر، دەزگایێ بۆ بژاردنی خانەکانی خوێن ◌ هموسیتومتر

**haemodialysis** /ˌhi:mə(ʊ)dʌɪ'alɪsɪs/ *noun*, US hemodialysis, *pl.* haemodialyses /-si:z/
(پزشکی) بێژاندنەوە یان دیالیزی گورچیلە ◌ دیالیز کلیه

**haemodynamic** *adjective*, US hemodynamic
(کارئەندامناسی) سەربە یان پێوەندی بە ڕەوت و ڕۆیینی خوێن لە نێو لەشەوە هەیە ◌ وابستە بە همودینامیک

**haemodynamics** *noun*, *pl.*, US hemodynamics
دینامیکی خوێن، لقێ لە کارئەندامناسی کە دەربارەی گەڕانی خوێن دەکۆڵێتەوە ◌ همودینامیک، پویایی‌شناسی خون

**haemoflagellate** *noun*, US hemoflagellate
protozoan یێکی شێلاقدار، ب.ت. تۆخمی Trypanosoma یان Leishmania کە مشەخۆرێکی خوێنە ◌ هموفلاجلیت

**haemoglobin** /ˌhi:mə'gləʊbɪn, US -'gloʊ-/ *noun*, US hemoglobin
(زیندەکیمیا) هیمۆگلۆبین: پرۆتێینێکی سوور کە ئاسنی تیایە، بەرپرسی ڕاگوێستنی ئۆکسیژێن لە خوێنی بڕبڕەداران دایە ◌ هموگلوبین

**haemoglobic** *adjective*, US hemoglobic
سەربە هێمۆگلۆبین ◌ وابستە بە هموگلوبین

**haemoglobinopathy** *adjective*, US hemoglobinopathy, *pl.* haemoglobinopathies
کێشە یان ناسازیێکی خوێن (وەک کەمخوێنی داسی sickle cell anemia) کە بەهۆی گۆڕانی بۆماوەیی یان ژێنێتیکی لە پێکهاتەی گەردی molecular هێمۆگلۆبین تووش دەبێ ◌ هموگلوبینوپاتی

**haemoglobinuria** *noun*, US hemoglobinuria
بوونی ماکی ڕەنگی یان پیگمێنتی هێمۆگلۆبین لە میزدا ◌ هموگلوبینوریا

**haemolymph** /'hi:mə(ʊ)lɪmf/ *noun*, US hemolymph
خوێنەلەشاو، هێمۆلیمف، شلەیێ fluid کە بەرامبەری خوێنە لە زۆربەی بێبڕبڕەکاندا invertebrate ◌ همولیف

**haemolysin** *noun*, US hemoglysin
ماکێ کە دەبێتە هۆی لێکهەڵوەشانی خرۆکە سوورەکانی خوێن، وەک ژاراوکی بەکتریایی bacterial toxin ◌ همولیزین

**haemolysis** /hi:'mɒlɪsɪs/ *noun*, US hemolysis
هیمۆلیسیس، هیمۆلیز، هیمالیز، تیاچوونی خرۆکە سوورەکانی خوێن ◌ همولیز

**haemolytic** /ˌhi:mə'lɪtɪk/ *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە هیمۆلیسیسەوە هەیە ◌ وابستە بە همولیز

**haemolytic disease of the newborn** *noun*
(پزشکی) جۆرێ کەمخوێنی ئاستەم لە ئاوەڵمە یان منالی ساوادا کە بە هۆی یەکنەکەوتن یان جیاوازی جۆرێ خوێنی دایک تووش دەبێ ◌ نوعی بیماری نوزاد یا جنین

**haemophilia** /ˌhi:mə'fɪlɪə/ *noun*, US hemophilia
هیمۆفیلی، هیمۆفیلیا ◌ هموفیلی

**haemophiliac** /ˌhi:mə'fɪliæk/ *adjective*
1 هیمۆفیلیایی، سەربە هیمۆفیلی 2 تووشبوو بە هیمۆفیلیا ◌ 1 وابستە بە هموفیلی 2 مبتلا بە هموفیلی

**haemopoiesis** /ˌhi:mə(ʊ)pɔɪ'i:sɪs/ *noun*, US hemopoiesis
بەرهەمهاتنی خانەکانی خوێن و پلاتیلێتەکان platelet لە مۆخی ئێسکدا bone marrow (هەروەها haematopoiesis) ◌ هموپویسیس

**haemopoietic** *adjective*

سەربە هیمۆپتیسیس ۞ وابستە بە هموپتیسیس

**haemoptysis** *noun*, US haemoptysis

بەڵغەمی خوێنی یان لە خوێن ۞ خلط خونین

**haemorhage** /ˈhɛmərɪdʒ/ *noun*, US hemorhage

1 خوێنبەربوون، خوێنڕژان، خوێنڕەوی، خوێنڕۆیی: *a massive brain/cerebral haemorrhage ◊ He was checked for any signs of haemorrhage* 2 دەرچوون، هەڵاتن: *Poor working conditions have led to a steady -rhage of qualified teachers from our schools* ۞ 1 خونریزی 2 گریز

**haemorrhoidal** /hɛməˈrɔɪdl/ *adjective*

۞ سەربە یان پێوەندی بە بێوەسیرییەوە هەیە وابستە بە بواسیر

**haemorrhoidectomy** *noun*, *pl.* haemorrhoidectomies, US hemorrhoidectomy

بێوەسیریبڕی، بێوەسیریدەرکێشی، دەرهێنانی نەشتەرگەرییانەی بێوەسیری ۞ همورویدکتومی

**haemorrhoids** /ˈhɛmərɔɪdz/ *noun*, US hemorhoids

بێوەسیری، باسوور، مایەسیری ۞ بواسیر

**haemoscopy** *noun*, US hemoscopy

خوێنبینی ۞ خوننمایی

**haemosiderin** *noun*, US hemosiderin

جۆرێ پیگمێنتی زەردی مەیلەو قاوەیی کە لە شیبوونەوەی breakdown هیمۆگلۆبین پەیدا دەبێ ۞ هموسیدرین

**haemostasis** /ˌhiːmə(ʊ)ˈsteɪsɪs/ *noun*, US hemostasis

1 وێستانی خوێن، خوێنگیران، گیرانی خوێن، خوێنبەندان، خوێنوێستان، خوێنبەستان 2 پۆنگی یان پۆنگخواردنەوەی stagnation خوێن لە بەشێکدا ۞ هیموستاز، هیموستاسیس

**haemostat** /ˈhiːməstat/ *adjective*, US haemostat

۞ خوێنبەست، خوێنوێستێن، خوێنوەستێن هیمواستات

**haemostatic** /ˌhiːməˈstætɪk/ *adjective*, US hemostatic

سەربە خوێنبەست یان خوێنوێستێن، سەربە خوێنوەستێن ۞ هیمواستاتیک

**hafiz** /ˈhɑːfɪz/ *noun*

حافز ۞ حافظ

**hafnium** /ˈhæfniəm/ *noun*

(کیمیا) هافنیۆم (بە ژ.گ. 72، ن. Hf؛ بنەڕەت: لە *Hafnia* شێوەی لاتینیکراوی *Havn* دانمارک، ناوی پێشووی Copenhagen) ۞ هافنیم

**haft** /hɑːft, US hæft/ *noun*

(چەقۆ، تەور و هتد) دەسک، کلک، کلکە، ئالقە، چەمبەری، جێدەس، مشتە، مشتۆ ۞ دسته، قبضه

**hag** /hæg/ *noun*

ژنەجادووگەر، کۆلەوەنانی، دەڵەدێو، پیرێژنی ناحەز ۞ ساحره، عفریته

**Hagar** *noun*, Hebrew *Hāghār*

هاجەر: ژنی برایم Abraham و دایکی سمایل Ishmael ۞ هاجر

**hagfish** *noun*, *pl.* same or hagfishes

مارماسی دەمخڕ cyclostome، مارماسی مشەخۆر (لەسەر کەلاکی ماسییە مردووەکانی تر دەخوا [*Myxine*] و توخمەکانی تر، خێزان Myxinidae) ۞ مارماهی انگلی

**Haggai** *noun*, Hebrew *Ḥaggai*

1 هاگی، هاگای، حەجی: پێغەمبەرێکی عیبری دەوروبەری 500ی بەرلە زایین (پشتگیری لە بەرسگەی Jerusalem کرد تا سازکرێتەوە) 2 کتێبی هاگا یان حەجی پێغەمبەر ۞ 1 حجی 2 کتاب حجی نبی

**haggard** /ˈhægəd, US -gərd/ *adjective*, *noun*

1 *adj* تێکچوو، ماندوو، شەکەت، قوپاو، پەککەوتوو، چاوبەقووڵاچوو، زەردوکز (لەبەر ماندوویی، بێخەوی یان نگەرانی) 2 نەگیراو، رامنەکراو، دەستەمۆنەکراو، کێوی، لاور *n* بازی گیراو (بە گەورەیی؛ haggardly *adv*) ۞ *adj* 1 خسته، فرسوده 2 وحشی *n* قوش دشت تولک

**haggardness** /ˈhægədnəs, US -gərdnəs/ *noun*

تێکچوویی، ماندوویی، شەکەتی، قوپاوی، چاوبەقووڵاچوویی، زەردوکزی ۞ خستگی، نزاری

**haggis** /ˈhægɪs/ *noun*, *pl.* same

هەگیس (= جۆرێ چێشتی سکاتلەندی، لە دڵ و جەرگ و سپەلاکی مەڕ) ۞ هگیس

**haggle** /ˈhægl/ *noun*

چەنەلێدان، چەنە، کێشە، مشتومڕ، شەڕەقسە، ئیراد، عەیبەلێگرتن ۞ چانەزنی، دعوا، خردەگیری

**haggling** *noun*

۞ چەنەلێدان، مشتومڕ، دەمەتەقێ، شەڕەقسە چانەزنی، جر و بحث

**hagi(o)-** *prefix*

پێشگر: قێددیسەکان، قێددیس، پیرۆز: *hagiographer* (بنەڕەت: لە *hagios* یۆنانییەوە "holy") ۞ پیشوند: قدیسان، قدیس، مقدس

**hagiocracy** /ˌhagɪˈɒkrəsɪ/ *noun*

هاگیوکراسی، فەرمانڕانی یان دەسەلاتداریتی قێددیسەکان ۞ قدیس‌سالاری

**Hagiographa** /ˌhagɪˈɒgrəfə/ *noun*, *pl.*

بەشی سێیەم لە تەورات (یا پەیمانی کۆن، بنەڕەت: لە یۆنانییەوە) ۞ بخش سوم از تورات

**hagiographer** /ˌhægiˈɒgrəfə(r), US -ˈɑːg-/ *noun*

سەربردەنووسی قێددیسەکان ۞ نویسندەی

سرگذشت قدیسان

**hagiographic** *adjective*, also hagiographical
سەربە سەربردەی قیددیسەکان ◌ وابستە بە سرگذشت قدیسان

**hagiography** /ˌhægiˈɒgrəfi, US -ˈɑːg-/ *noun*
سەربردەی قیددیسەکان، پەسننامە ◌ سرگذشت قدیسان. هاگیوگرافی

**hagiolatry** /ˌh&gɪˈɒlətri/ *noun*
پەرستنی قیددیسەکان ◌ پرستش قدیسان

**hagiological** *adjective*, also hagiologic
سەربە ویژەی قیددیسەکان ◌ وابستە بە ادبیات قدیسان

**hagiologist** *noun*
نووسەری ویژەی قیددیسەکان ◌ نویسندەی ادبیات قدیسان

**hagiology** /ˌh&gɪˈɒlədʒi/ *noun*
ویژەی قیددیسەکان (لقێ لە ویژە کە باسی سەربردەی قیددیسەکان دەکا) ◌ ادبیات قدیسان

**hagridden** /ˈhægrɪdn/ *adjective*
ترساو، تۆقیو، نگەران ◌ وحشت‌زده، نگران

**hah** /hɑː/ = ha

**ha ha** /ˈhɑː hɑː/ *interjection*
قاقا، حیلکەحیلک ◌ قاه‌قاه

**ha-ha** /ˈhɑː hɑː/ *noun*
نەردەی کورت، دیواری کورت، پاردە، پەرژین، تامان (بە دەوری پارک و باغدا) ◌ نردەی کوتاه

**haham** /ˈhɑːhəm/ *noun*, also chacham
ریبەری مانایی یان ئایینی جووەکانی Sephardi ◌ هاهام

**Haida** /ˈhʌɪdə/ *noun, pl.* same or Haidas
1 ئەندامی گەلی سووریێست، کە لە کەناری پاسیفیکی کەنەدا دەژین 2 زمانی ئەو گەلە ◌ هایدا

**haiku** /ˈhaɪkuː/ *noun, pl.* same or haikus
جۆرێ هەلبەستی سێ دیری حەقدە برگەیی ژاپۆنی، لە پێنج، حەوت و پێنج برگە پێکهاتووە ◌ هایکو

**hail**[1] /heɪl/ *noun*
1 تەرزە، تەیرۆک، گلێرە، خرخرۆک (ژیلە: هی ورد) 2 (خوازە) ریژنە، رەهێلە، لێشاو، لۆدە ◌ 1 تگرگ، رگبار 2 (مجازی) سیل

**hail**[2] /heɪl/ *noun*
1 سلاو، چاک‌وخۆشی 2 پێشوازی، پێرگێنی ◌ 1 درود 2 استقبال

**hail-fellow-well-met** *adjective*
رووخۆش ◌ خوش‌مشرب

**Hail Mary** /ˌheɪl ˈmeəri, US ˈmeri/ *noun, pl.* Hail Marys
دۆعا و نوێژی کلێسەی کاتۆلیکی رۆم بۆ Mary دایکی عیسا ◌ هایل ماری

**hailstone** /ˈheɪlstəʊn, US -stoʊn/ *noun*
دەنکی تەرزە، دەنکە گلێرە ◌ دانەی تگرگ

**hailstorm** /ˈheɪlstɔːm, US -stɔːrm/ *noun*
تەرزەلوول، رەشەبا یا باوبۆرانی تەرزە، تەرزەلووکە ◌ توفان تگرگ

**hair** /heə(r), US her/ *noun*
1 قژ، تووک، پرچ، گێس، زولف، موو 2 قژەکان، موو، مووەکان، تووک، تووک 3 تووکی سەر 4 چل، تال 5 کولک 6 بریکی کەم، مەودایێکی کەم، کەم‌دوور ◌ 1 مو، گیس 2 موها 3 موی سر 4 تار مو 5 کرک 6 مقدار کم

**hairball** = trichobezoar

**hairbreadth** *noun*
بر یان مەودایێکی کەم، بستێ، هەنگاوێ ◌ مقدار یا فاصلەی کم

**hairbrush** /ˈheəbrʌʃ, US ˈherb-/ *noun*
شانەی سەر، برۆسی قژ ◌ برس مو

**haircloth** /ˈheəklɔːθ/ *noun*
کوتالی مووی یا مەوجی، کوتالی جاجمی، پلاسە، پارچەی تووکن یان لە موو ◌ پارچەی مویی

**haircut** /ˈheəkʌt, US ˈherkʌt/ *noun*
1 قژ کورت‌کردنەوە: *You need a haircut* ◊ *I see you've had a haircut* 2 شێوە یان شێوازی قژ: *a trendy haircut* ◊ *What do you think of my new haircut?* ◌ 1 اصلاح مو 2 مدل مو

**hairdo** /ˈheəduː, US ˈherduː/ *noun, pl.* hairdos
شێوە یان شێوازی قژ ◌ مدل مو

**hairdresser** /ˈheədresə(r), US ˈherd-/ *noun*
سەلمانی، جوان‌کار ◌ آرایشگر

**hairdressing** *noun*
جوان‌کاری، کاری سەلمانی ◌ آرایش‌گری

**hairdryer** /ˈheədraɪə(r), US ˈherd-/ *noun*, also hairdrier
وشکەک، قژوشکێن، قژوشک‌کەرەوە، سیشوار ◌ سشوار

**hairgrip** /ˈheəgrɪp, US ˈherg-/ *noun*
گیرەی قژ، قژبەست ◌ گیرەی سر

**hairiness** /ˈheərinəs/ *noun*
مووئاسایی، تووک‌ئاسایی، لە قژچوویی ◌ مومانندی

**hairless** /ˈheələs, US ˈherləs/ *adjective*
بێ‌تووک، تاس، کەچەل، سەرڕووتاو، کۆستە ◌ تاس

**hairline** /ˈheəlaɪn, US ˈherl-/ *noun*
1 جێگای شینبوونی قژ (لە سەرووی ناوچاوانەوە): *a receding hairline* 2 گوریس، کەندر، تەناف(ی مووی) 3 (خوازە) هێلی باریک، ناسکەهێل، هێلی موویین: *a hairline*

3 طناب مـویی 2 خط مو 1 ◌ crack/fracture (مجازی) خط نازک

**hairnet** /'heənet, US 'hernet/ *noun*
تۆڕی قژ، تۆڕی سەر ◌ تور مو

**hair-oil** *noun*
ڕۆنی سەر، ڕۆنی قژ ◌ روغن مو

**hairpiece** /'heəpi:s, US 'herp-/ *noun*
زەڕبڕچ، کلاوقژ، مووچاخ ◌ کلاهگیس

**hairpin** /'heəpın, US 'herpın/ *noun*
دەرزیقژ ◌ سنجاق سر

**hairpin bend** *noun*, also hairpin curve or hairpin turn
(ڕێگـا) پێچـی تونـد یـان سـەخت، پێچـی چەڵەمەئاسا ◌ پیچ تند

**hair-raising** *adjective*
ترسـناک، ترسـێنەر، مووبزەوەکەر، ترساوی: *a hair-raising adventure/story* ◌ وحشتناک، هولناک

**hair-restorer** *noun*
گەشەپێدەری قژ ◌ تقویتکنندەی مو

**hair's breadth** = hairbreadth

**hair shirt** *noun*
کونجـک، جلـەخوری، خەرقـە (بـۆ خۆسـزادان لەباری دینییەوە) ◌ خرقه

**hairslide** /'heəslaıd, US 'hers-/ *noun*
گیرەی سەر، قژگیرە، گوڵـی سـەر، قژبەسـت ◌ گیرەی سر

**hair-splitting** /'heə splıtıŋ/ *noun, adjective*
*n* موو لـە ماسـت دەرکێشـان، مووقلیشـی، وردی *adj* هیچەکـە، ناگرنـگ، هـیچ (hair-splitter /'heə splıtə(r)/ *n*: موو لە ماست دەرکێش، مووقلیش، ورد) ◌ *n* موشکافی *adj* جزئی

**hairspring** /'heə sprıŋ/ *noun*
زەمبەلـەک (هـی پانـدۆل یـان لەنگـەرە) ◌ فنـر (پاندول)

**hairstyle** /'heəstaıl, US 'hers-/ *noun*
شـێوەی سـەر، شـێوازی قـژ، جـوانکـردنی قـژ، شـێوازی ڕازاندنـەوەی قـژ (hairstylist /'heəstaılıst, US 'hers-/ *n* ◌ مـدل مـو، آرایش مو

**hair trigger** *noun, adjective*
*n* پەلەپیتکـەی زوودەرچـوو *adj* (hair-trigger) فیشەکی، ئالەتی، زووتووڕە، هەڵـتۆز، جینگزی ◌ *n* ماشەی حساس *adj* آتشی

**hairworm** /'heə wɜ:m/ *noun*, also hair worm
مـووکرم، کرمـەموویینـە، کرمەباریکـە، باریـک و درێژ، پێوەندی بە nematode ـەکانەوە هەیە، کرمینەکانی مشەخۆری arthropod ـەکانن [لق Nematomorpha] ◌ پیوک، رشته

**hairy** /'heəri, US 'heri/ *adjective* (hairier, hairiest)
1 تووکن، پڕتووک، تووکاوی، تیسکن، مووداوی، قژن، کوڵکن، تـووکئاسـا، مووئاسا: *a hairy plants with hairy stems* ◊ *chest/monster* 2 (نافـەرمـی) مەترسـیدار، پڕمەترسـی، ترسـناک: *Driving on icy roads can be pretty hairy* ◊ *a hairy experience* ◊ 1 ◌ پـشمالو، مـودار، مانند مو 2 خطرناک، وحشتناک

**Haitian** /'heıʃıən, US -ʃ(ə)n/ *adjective, noun*
*adj* سـەربە هائیتی، زمانەکەی یان خەڵکەکەی *n* 1 خەڵکی هائیتی 2 (هەروەها Haitian Creole) زمـانی کریئـۆلی لەسـەر بنچینـەی فەڕەنسـی، لە هـائیتی قسـەی پێ دەکرێ ◌ *adj* وابسـته بـه هائیتی، زبان و مردم هائیتی *n* زبان کریولی هائیتی

**haj(j)** /hædʒ/ *noun*
حــەج (بنــەڕەت: لــە *ḥajj (al-)* عــەرەبی "زیارەت(ی گەورە)") ◌ حج

**haka** /'hɑ:kə/ *noun*
هاکا (سەمایەکی نەریتی شـەڕی مـائۆری Maori لەگەڵ گۆرانیوتندا، لە مائۆرییەوە) ◌ هاکا

**hake** /heık/ *noun*
هەیک، لە تیرەی ماسی cod، سەر و شەویلکەی درێـژ و ددانبــەقــەوەت [ *Merluccius merluccius* و جۆرەکانی تر] ◌ هیک

**hakenkreuz** /'hɑ:k(ə)n͵krɔıts, German 'hɑ:kən͵krɔyts/ *noun*
قولاپخاچینە، سواستیکا (ب.ت. وەک هێمـای نازی، بنەڕەت: ئەڵمانی، لە *Haken* "قولاپ" + *Kreuz* "خاچ") ◌ سواستیکا

**hakim** /hæ'ki:m/ *noun*
حــەکیم (دوکتــۆری مــسوڵمان، بنــەڕەت: لــە *ḥakīm* عەرەبییەوە) ◌ حکیم

**Hakka** /'hækə/ *noun*
1 ئەندامی گەلی باشووری ڕۆژهەڵاتی چین، کە لە باکوورە بەدرێژایی سەدەی دوازدە کۆچیـان کرد 2 هەکی، هاکا (شێوەیەکی چینی کە کۆمەڵێ لە خەڵکانی باشووری ڕۆژهـەڵاتی چـین قـسەی پێدەکەن) ◌ هاکا

**Halacha** /͵hɑlɑ:'xɑ:, hə'lɑ:kə/ *noun*, also Halakah
قانوون یان مافناسی جوولەکە، لەسـەر بنچینـەی Talmud (بنـەڕەت: لـە *hălākāh* عیـبری بـە واتای "قانوون") ◌ هالاکا

**Halachic** *adjective*
سـەربە قـانوون یـان مـافناسـی جوولەکـە ◌ وابسته به هالاکا

**halal** /'hælæl/ *noun, adjective*
*n* گۆشـتی گیانـەوەری سـەربڕاو بـەپێی قـانونی ئیسلام *adj* حەڵاڵ ◌ *n* گوشت ذبح اسلامی *adj*

حلال

**halala** /hə'lɑːlə/ *noun*
یەکەی پارەی عەرەبستان، بەرامبەر بە سەدیەکی rial (بنەڕەت: لە عەرەبییەوە) ◌ حلالا

**halation** /hə'leɪʃ(ə)n/ *noun*
خەرمانە، نیوەسێبەر (لە پەردەی تەلەفزیۆن یا وێنەگری‌دا) ◌ هالاسیون

**halberd** /'hælbɜːd, US -bərd/ *noun*
(مێژوویی) تەورزین، تەوردەس، رمتەور، spear و battleaxe لێکدراو (بنەڕەت: لە *helm* ("handle" + *barde* "hatchet") ◌ تبرزین

**halberdier** /ˌhælbə'dɪə/ *noun*
تەورزین‌بەدەس، تەورزین‌دار، تەورزین‌هەڵگر ◌ تبرزین‌دار

**halcyon** /'hælsiən/ *adjective, noun*
*adj* شاد، خۆش، وەش *n* 1 شاماسی گەرمێنانی ئەفریکا و ئاسیا، بە باڵوبەری رەنگینی گەشەوە [تــوخم *Halcyon*: زۆر جـــۆرن] 2 جـــۆرێ باڵندەی ئەفسانەیی کە گوایە لەسەر هێلانەیێ بە کڕ دەکەوێ کە بەسەر ئاوەوەیە ◌ *adj* خوش *n* 1 نوعی ماهی 2 نوعی پرندەی افسانەای

**halcyon days** *noun*
رۆژگارێکی خۆش، زەمان یان سەردەمانێکی خۆش ◌ دوران خوش

**haldi** /'hʌldi/ Indian term for turmeric

**hale** /heɪl/ *adjective*
(پیرە پیاوێ) بەقەوەت، بەگوڕ، بەتین، بەبنگە، گوستاخ، بەهێز، تەندوست، ساغ ◌ قوی، سالم

**hale and hearty** *adjective*
بەقەوەت، بەهێز، تەندوست، بەبنگە، ساغ، لەش‌ساغ، بەگوڕ (ب.ت. پیر)، sound: *a hale and hearty old man* ◌ قوی، سالم

**haler** /'hɑːlə/ *noun, pl.* same or haleru /'hɑːləruː/
یەکەی بنەڕەتی پارەی کۆماری چێک و سلۆڤاکیا، بەرامبەر بە سەدیەکی koruna (لە *Schwäbisch Hall*، شارێکی ئەڵمانی کە لەوێ کۆینەکان لێدەدران) ◌ هالر

**half** /hɑːf, US hæf/ *noun (pl.* halves*), adjective, adverb*
*n* 1 نیو، نیوە، نیف، لا 2 ژمارەی دوویەک ½، ژمارەی نیو 3 تیکێتی نیوەبایی، بلیتی لانرخ 4 (پیرە) نیوپایتی *adj* نیوەی، نیو *adv* نیوە، لەت، تا ئەندازەیێ، تا رادەیێ ◌ *n* 1 نیم، نیمە، نصف 2 عدد یک دوم 3 بلیط نصف قیمت 4 نیم‌پایتی *adj* نیمی از، نصف *adv* نیمە، تا حدی

**half-**
(زۆرتر لە لێکدانا) نیوە- ◌ (در ترکیب) نیمە

**half a crown** *noun*
(لە بریتانیا، بەر لە 1971) کۆینی دوو شیلینگ و نیوێ ◌ سکەی دو شیلینگ و نیمی

**half a dozen** *noun*
نەشە، شەش‌دانەیی، نیودووجین، نیودۆزین، دەستێکی شەش‌دانەیی ◌ شش‌تایی

**half and half** *noun adjective*
*n* تێکەڵەیێ نیوەی لە شیر و نیوەی‌تر لە توێشکە، بۆ چایی و قاوە *adj* نیوانیو ◌ *n* هاف اند هاف *adj* نصفانصف

**half-arsed** *adjective*
کەری نەفام ◌ احمق بی‌شعور

**halfback** /'hɑːfbæk, US 'hæf-/ *noun*
یاریزانی هێڵی نیوەڕاست ◌ هافبک

**half-baked** /'hɑːfeɪkt/ *adjective*
1 نیوەبرژاو، پاش‌نەبرژاو، هەڵەپرۆز 2 بێ‌بەرنامە، هەڵنەسەنگێنراو، لێکەوەنەدراو، ناژیرانە، سەرسەرەکی، قشە، دیمی، نیمچە: *a half-baked idea* ◌ 1 نیم‌پختە 2 نسنجیدە، غیرعاقلانە

**half bath** *noun*
دەس‌بەئاوی ژنان ◌ توالت بانوان

**halfbeak** *noun*
جۆرێ ماسی کەناری بارێک، پێوەندی بە flying fish ـەکانەوە هەیە [*Euleptorhamphus viridis* و جۆرەکانی تر] ◌ نوعی ماهی

**half board** *noun*
(هوتێل) دیو لەگەڵ نانی بەیانی، نیوەڕۆ و شێو ◌ اتاق با صبحانە، نهار و شام

**half-breed** /'hɑːf briːd/ *adjective*
(بۆ سووکایەتی) دووڕەگە، دووڕەگ، نارەسەن، زۆڵ ◌ دورگە

**half-brother** /'hɑːf brʌðə(r)/ *noun*
زربرا، لابرا، براماک ◌ برادر ناتنی

**half-caste** /'hɑːf kɑːst/ *noun*
(بۆ سووکایەتی، کەسێ) دووڕەگە، دووڕە ◌ دورگە

**half cock** /ˌhɑːf 'kɒk/ *noun*, also half-cock or half cocked
1 (چەک‌وچۆڵ) نیوەکێشراو، نیوەسوار 2 دەس‌پێکردنی ناوەخت (*adj* half-cocked: نیوەکولاو، نیوەکوڵ) ◌ 1 نیمەمسلح 2 شروع بی‌موقع

**half-crazed** *adjective*
1 شێت‌بوو، هەڵبوو، رق‌هەستاو 2 شێتانە ◌ 1 برآشفتە 2 دیوانەوار

**half-crown** /ˌhɑːf 'kraʊn/ = half a crown

**half-day** *noun*
(وچان) دان، نیوەڕۆژ، لارۆژ ◌ نصف روز

**half-dead** *adjective*
ماندوو، لەپێ‌کەوتوو، نیوەمردوو، شەکەت ◌ ازپاافتادە، خستە

**half dollar** *noun*
نیودۆلاری، پەنجا سێنت ◌ نیم‌دلاری

**half-hardy** *adjective*

1 پرطاقــــت، *hardy annual/perennial* ◇ نیرومند، پرجرأت، بی‌باک 2 (گیاه) مقاوم

**hare** /heə(r), US her/ *noun*
(گیانەوەرناســـی) کەرویــشکی دەشـــتی، کەرویــشکەکێوی [*Lepus europaeus*] (هــی قاوەیی) و جۆرەکانی تر] ◇ خرگوش

**harebell** /ˈheəbel, US ˈherbel/ *noun*
سملی کێوی [*Campanula rotundifolia*] ◇ سنبل کوهی

**hare-brained** *adjective*
گەوج، شێت، گەوجانە، شێتانە ◇ احمق، دیوانە، احمقانە

**Haredi** /haˈrɛdi/ *noun, pl.* Haredim /-dɪm/
ئەنــــدامی هەریــــەک لــــە تــــیرە جــــووە ڕاســتباوەڕەکان، کە سوورن لەسەر پێبەندبوون بە قانوونی نەریتی خۆیان ◇ هاردی

**Hare Krishna** /ˌhæri ˈkrɪʃnə, ˌhɑːreɪ/ *noun*
ئەندامی کۆمەڵەی نێونەتەوەیی هۆشیاری کریــشنا، تــیرەیێکــی دیــنی لەســەر بنچینــەی پــەرستنی خــودای هێنــدووەکــان "کریــشنا" (بنــەڕەت: سانــسکریت بــە واتــای "ئــەی ڤیــشنۆ کریشنا") ◇ هاری کریشنا

**harelip** /ˈheəlɪp, US ˈherlɪp/ *noun*
(ئێستا قسەیەکی ناخۆشە) لێوکەت، کەت، کەتە ◇ لب‌شکری

**harelipped** /ˌheəˈlɪpt, US ˌherˈlɪpt/ *adjective*
لێوکەت، کەت، کەتە ◇ لب‌شکری

**harem** /ˈhɑːriːm, -rəm, US ˈhærəm/ *noun*
حەرەمخانە، ئەندەروون، ژنانی حەرەمخانە ◇ حرم‌سرا، زنان حرم‌سرا

**hare's-foot** *noun*
(رووەکناسی، شەوەرە) پێ‌کەرویشکە؟: جۆرێ شــەوەر cloverی باریــک [*Trifolium arvense*] ◇ نوعی شبدر

**hare's-tail** *noun*
(رووەکناسی) کلکەکەرویشکە؟: جۆرێ گیای مەدیتەرانەیی [*Lagurus ovatus*] ◇ نوعی گیاه

**harewood** *noun*
(رووەکناسی) جـۆرێ داری ڕیـزیی درەختی sycamore، بۆ دروستکردنی کەلوپەلی نێومال بەکاردێت ◇ نوعی چوب

**haricot** /ˈhærɪkəʊ, US -koʊ/ *noun*
لوبیا، باقلە، باقلەسپی، (لوبیا، باقلە یان فاسۆلیای وشک haricot bean) ◇ لوبیا، لوبیا سفید

**harlequin** /ˈhɑːləkwɪn, US ˈhɑːrl-/ *noun, adjective*
*n* 1 کۆستەبابی، گالتەجار، قۆشمە، تەلـخەک (جلی رەنگاورەنگ یان خاڵخاڵ (بە شێوەی خشت) لەبەر دەکا) 2 جۆرێ سەگی چکۆلەی خـاڵدار 3 جــۆرێ مــراوی [*Histrionicus histrionicus*] *adj* رەنگاورەنگ ◇ *n* 1 دلقک، لودگی 2 نوعی سگ 3 نوعی مرغابی *adj* رنگارنگ

**harlequinade** /ˌhɑːlɪkwɪˈneɪd/ *noun*
کاری کۆستەبابی، قۆشمەیی، گالتەجاری ◇ دلقک‌بازی

**harlequin bug** *noun*, also called cabbage bug or calico bug
مێرووەبۆگەنەیێ stink bug، بە خاڵی زەرد و ســوورەوە کــە مێمــلی کــەلــەم و رووەکــە پێوەندیدارەکانە [*Murgantia histrionica*] ◇ نوعی حشره

**harlequin fish** *noun*
ماسی‌یەگالتە(جارە): جۆرێ ماسی رەنگاورەنگی ئاوە شیرینەکانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا [*Rasbora heteromorpha*] ◇ نوعی ماهی

**Harley Street** /ˈhɑːli striːt, US ˈhɑːrli/ *noun*
شەقامی هارلی (شەقامێ لە ناوەندی لەندەن کە زۆربەی زۆری دوکتورە تایبەتی‌یەکان لەوێ ئافیسان هەیە) ◇ هارلی استریت

**harlot** /ˈhɑːlət/ *noun*
قەحبە، سۆزانی، ژنی حیز، لەشفرۆش، قەلتاخ ◇ روسپی

**harlotry** /ˈhɑːlətri/ *noun*
قەحبەگەری، حیزیتی، لەشفرۆشی، قەلتاخی ◇ روسپی‌گری

**harm** /hɑːm, US hɑːrm/ *noun*
ئازار، عەزیەت، وەزەنگ، ئێش، برین، زیان، زرار، زەڕ، کەتن، وەی، مەرە، زەرەر، خەسار: *He would never frighten anyone or cause anyone any harm* ◇ *Hard work never did them any harm* ◇ اذیت، آسیب، ضرر، خسارت

**harmatten** /hɑːˈmat(ə)n/ *noun*
بایەکی وشک و تەپوتۆزاوی کەناری رۆژاوای ئەفریکا، لە دیسامبرەوە تا فێبریوێری هەڵدەکا ◇ هارماتن

**harmel** *noun*, also harmel peganum, African rue, Syrian rue or wild rue
ئەسپەندەر، ئەسپەنەر، قانگ [*Peganum harmala*] ◇ اسفند، اسپند

**harmful** /ˈhɑːmfl, US ˈhɑːrmfl/ *adjective*
زیاناوی، زیانپێگەیێن، ئێشپێگەیێن، موزیر، بەزەڕ، خراپ، پرمەترسی، مەترسی‌دار: *the harmful effects of alcohol* ◇ *the sun's harmful ultra-violet rays* ◇ مضر، موذی، خطرناک

**harmfully** /-fəli/ *adverb*
بە شێوەیەکی زیاناوی ◇ بە طور موذی

**harmfulness** /ˈhɑːmflnəs, US ˈhɑːrmflnəs/ *noun*
برین، زیان، ئێش، خەسار، وەی، تەوەرە، زەرەر

◌ آسیب، صدمه

**harmless** /'hɑ:mləs, US 'hɑ:rm-/ *adjective*

1 بێ‌زیان، بێ‌مەترسی، بێ‌زەرەر، بێ‌ئازار، بێ‌وەی، بێ‌وەزەن 2 بێ‌گوناهـ بێ‌گوناهانە ◌ 1 بی‌ضرر 2 معصوم، معصومانه

**harmlessly** /'hɑ:mləsli, US 'hɑ:rm-/ *adverb*

بێ‌وەیانە، بە شێوەیێکی بێ‌وەی، بێ‌ئازارانە، زیانی پێناگەیێنی: *The missile fell -essly into the sea* ◌ به طور بی‌ضرر، بدون ایجاد خسارت

**harmlessness** /'hɑ:mləsnəs, US 'hɑ:rm-/ *noun*

بێ‌وەی‌بوون، بێ‌وەیی، بێ‌ئازاری، زیان پێنەگەیاندن ◌ بی‌ضرربودن، عدم ایجاد خسارت

**harmonic** /hɑ:'mɒnɪk, US hɑ:r'mɑ:n-/ *noun, adjective*

*n* (موسیقا) هارمۆنیک، نۆتی ریک‌کەوتوو یان یەکانگیر: *the harmonic and rhythmic interest of the music* *adj* ریک‌کەوتوو، یەک‌کەوتوو، سازاو، دەم‌ساز، گونجاو، پێک‌خواردوو، پێکەوەکارکردوو ◌ *n* هارمونیک *adj* هم‌ساز، هماهنگ، موافق

**harmonica** /hɑ:'mɒnɪkə, US hɑ:r'mɑ:n-/ *noun*

هارمۆنیکا، ئامێر یا سازی دەمی ◌ ساز دهنی

**harmonious** /hɑ:'məʊniəs, US hɑ:r'moʊ-/ *adjective*

1 ریک‌وپێک، لێک‌هاتوو، پێک‌خواردوو، پێکەوەگونجاو، پێکەوەکارکردوو، ریک‌کەوتوو، یەک‌کەوتوو، کۆک، سازاو، گونجاو، هاوگونجاو: *blended into a harmonious whole* 2 خۆش‌ئاواز، بلاوێن، دەنگ‌خۆش ◌ 1 موزون، هماهنگ، موافق، سازگار 2 آهنگین

**harmoniously** /hɑ:'məʊniəsli, US hɑ:r'moʊ-/ *adverb*

ریک‌کەوتووانە: *They worked very harmoniously together* ◌ به طور هماهنگ

**harmonium** /hɑ:'məʊniəm, US hɑ:r'moʊ-/ *noun*

هارمۆنیۆم (= ئامێرێ کە شێوەی ئۆرگێکی چکۆلانە دەدا) ◌ هارمونیوم

**harmonization** /ˌhɑ:mənaɪ'zeɪʃn, US ˌhɑ:rmənə'z-/ *noun*

ریکخستن، گونجاندن، پێکەوەگونجاندن، کۆک‌کردن، سازدان، سازان، کۆک‌بوون، گونجان، یەک‌گرتنەوە ◌ هماهنگ‌سازی، تطبیق، هماهنگی، سازگاری

**harmony** /'hɑ:məni, US 'hɑ:rm-/ *noun, pl.* harmonies

1 ریککەوتن، سازان، کۆک‌بوون، گونجان: *the need to be in harmony with our environment* 2 *social/racial harmony* ◊ (موسیقا) لێکدانی نۆت یان دەنگە جۆراوجۆرەکان، هارمۆنی: *to study four-part harmony* ◊ *to sing in harmony* ◌ 1 هماهنگی، توافق، سازگاری 2 هارمونی

**harness** /'hɑ:nɪs, US 'hɑ:rnɪs/ *noun*

1 شێل، رەخت و کەلوپەلی ئەسپ (لەغاو، کەژوو و هتد) 2 (چەترسواری) پشتێنە، کەمەربەست، بەست: *a safety harness* 3 دەسرازە، کوماتەک ◌ 1 ساز و برگ اسب 2 کمربند 3 قلاده‌ی بچه

**harp** /hɑ:p, US hɑ:rp/ *noun*

چەنگ، هارپ (ئامێرێکی موسیقایە) ◌ چنگ

**harpist** /'hɑ:pɪst, US 'hɑ:rp-/ *noun,* also harper

چەنگی، چەنگ‌ژەن، هارپ‌ژەن ◌ چنگ‌نواز

**harpoon** /hɑ:'pu:n, US hɑ:r'p-/ *noun*

رم، رمب (بۆ راوە نەهەنگ) ◌ زوبین

**harpoon-gun** /hɑ:'pu:n gʌn/ *noun*

رماوێژ، رمب‌هاوێژ، رم‌خەر ◌ زوبین‌انداز

**harp seal** *noun*

(گیانەوەرناسی) بەرازەچەنگە: بەرازی ئاوی باریکی ئاتلانتیکی باکووری، لەسەر پشتە شینکی یەکەی نیشانەیێکی چەنگ‌ئاسای تاریکی هەیە [*Phoca groenlandica*] ◌ هارپ سیل

**harpsichord** /'hɑ:psɪkɔ:d, US 'hɑ:rpsɪkɔ:rd/ *noun*

هارپسیکۆرد (= ئامێرێکی موسیقایە لە پیانۆ دەچێ) ◌ هارپسیکورد

**harpsichordist** /'hɑ:psɪkɔ:dɪst, US 'hɑ:rpsɪkɔ:rd-/ *noun*

هارپسیکۆردژەن ◌ نوازنده‌ی هارپسیکورد

**harpy** /'hɑ:pi, US 'hɑ:rpi/ *noun, pl.* harpies

1 (Harpy) هارپی (= دێوێ بە سەرولەشی ژن و چنگ‌وبالی باڵندەوە، لە میتۆلۆژی یۆنان و رۆم‌دا) 2 (پیرێژنی) قوێتر ◌ 1 هارپی 2 عجوزه

**harpy eagle** *noun*

هەڵۆهارپی: جۆرێ هەڵۆی زۆرزلەی پۆپنەی دارستانە بارانی‌یەکانی گەرمێنان [*Harpia harpyja* (ئەمریکای باشووری) و *Harpyopsis novaeguineae* (گینەی نوێ)] ◌ نوعی عقاب

**harquebus** /'hɑ:kwɪbəs/ *noun.* also arquebus

(تفەنگ) قرمە، شمخاڵ، قولاپینە (بنەرەت: لە ئەلمانی‌یەوە، *hake* "قولاپ" و *busse* "چەک، تفەنگ") ◌ شمخال

**harridan** /'hærɪdən/ *noun*

پیرێژنی بەدخوو ◌ عجوزه‌ی بدعنق

**harrier** /'hæriə(r)/ *noun*

1 تانجی، تاژی، تاجی (بۆ راوه کەرویشک) 2 ئەندامی تیپی راکردنی دەشتی یان لە دەشت 3 (گیانەوەرناسی) باز [توخم Circus: چەندین جۆرن] 4 تالانچی، راوڕووتکەر ۞ 1 سگ شکاری 2 دوندەی صحرانوردی 3 قوش 4 غارتگر

**harrow** /'hærəʊ, US -roʊ/ *noun*

مالوو، زەویرن، خیشک، لیسە، زنجەلە، کولۆکوت ۞ کلوخ‌شکن

**harrowed** *adjective*

نگەران، نارەحەت ۞ مضطرب

**harrowing** /'hærəʊɪŋ, US -roʊ-/ *adjective*

جەرگبڕ، ناخۆش، تال، دلتەزێن، بەسوێ ۞ دلخراش، عذاب‌دهنده

**harsh** /hɑːʃ, US hɑːrʃ/ *adjective*

1 توند، گڕ، نووساو، زەق، زبر، ناخۆش 2 توندوتیژ، توند، چەتوون، سەخت، گران، قورس: *a harsh winter/wind* 3 بێبەزەیی، رەشکوژ، زەبربەدەس، دلڕەق، دڕ، سەختگر، توندگر، سەختگرانە، بێبەزەییانە ۞ 1 خشن، زمخت، زننده، نامطبوع 2 شدید، حاد 3 سختگیر، بی‌رحم، بی‌رحمانه

**harshly** /hɑːʃli, US hɑːrʃli/ *adverb*

بە سەختی، بە قورسی: *She was treated very harshly* ۞ به سختی

**harshness** /hɑːʃnəs, US hɑːrʃnəs/ *noun*

سەختی، چەتوونی، گرانی، ئاسێبوون، زبری، توندی، توندوتیژی، بێبەزەییتی، رەشکوژی، بێرەحمی، دلڕەقی، دڕیتی، سەختگری ۞ صعوبت، درشتی، زمختی، خشونت، بی‌رحمی

**hart** /hɑːt, US hɑːrt/ *noun*

نێراسک، ئاسکی نێر (ب.ت. ئاسکی سوور لەژوور 5 سال) ۞ گوزن نر

**hartal** /'hɑːtɑːl, US 'hətɑːl/ *noun*

(لە نیمچەوشکاری هیند) داخستنی دووکان و فەرمانگەکان بە نیشانەی دەربڕینی نارەزایەتی یان ماتەمی، دووکانبەندان ۞ هارتال

**hartebeest** /'hɑːtɪbiːst/ *noun*

ئاسکی شاخ‌چەماو یا ئەفریکایی، ئاسکەکێوی شاخ‌چەماو، [*Alcelaphus buselaphus* (سوورەکەی) و جۆرەکانی تر] ۞ آهوی آفریقایی

**hartshorn** /'hɑːtsˌhɔːn/ *noun*

شاخی ئاسکی (گیراوە solution یێکی ئامۆنیا بۆ تواندنەوەی خوێ، جاران لە شاخی ئاسک دەیانگرت) ۞ هارت‌شورن

**harum-scarum** /ˌheərəm 'skeərəm, US ˌherəm 'skerəm, ˌhærəm 'skærəm/ *adjective*

1 هەلەشە، سەرچل، سەرەڕۆ، reckless، 2 impetuous کێوی، ئالۆری ۞ 1 سربەهوا 2 وحشیانه، لاابالی

**haruspex** /hə'rʌspɛks/ *noun, pl.* haruspices /-spɪsiːz/

(لە رۆمی کۆندا) فالگرەوە، پێش‌بین، پێش‌زان ۞ غیب‌گو

**haruspication** /hə'rʌspɪkeɪʃən/ *noun*

پێش‌بینی، فالگرتنەوە، فالگری، پێش‌زانی ۞ غیب‌گویی

**haruspicy** /hə'rʌspɪsi/ *noun*

پێش‌بینی، فالگرتنەوە، غەیب‌زانی، پێش‌زانی ۞ غیب‌گویی

**harvest** /'hɑːvɪst, US 'hɑːrv-/ *noun*

1 دروێنە 2 دروێنەکردن 3 جۆزەردان، گەنمزەردان، سەروبەندی دروێنە، قەف‌وگول، گولپەڕ 4 وەختی خلەوخەرمان، (گێرە و)کێشە، خەرمانان 5 خەرمان، پێدەر، ئەزار 6 بەروبوو، حاسل، خلەوخەرمان، بەرهەم، بەرێل 7 (خوازە) ئاکام، بەرهەم، ئەنجام ۞ 1 درو 2 عمل درو 3 هنگام درو، فصل درو 4 وقت خرمن 5 خرمن 6 محصول 7 نتیجه

**harvester** /'hɑːvɪstə(r), US 'hɑːrv-/ *noun*

1 دەزگای دروونەوە 2 دروێنەوان ۞ 1 ماشین درو 2 دروگر

**harvest home** *noun*

1 خەرمانەسوور(ان)، سوورانە، خەرمانلۆغان، سەربرانەی خەرمان 2 خەرمانان، سەروبەندی خەرمان ۞ 1 جشن خرمن 2 وقت خرمن

**harvestman** *noun, pl.* harvestmen

1 دروێنەوان، خەرمانەوان 2 جۆرێ جالجالووکە، دروێنەوانە [دەستە Opiliones: زۆر جۆرن] ۞ 1 دروگر، خرمن‌بردار 2 نوعی عنکبوت

**harvest mite** *noun*

جۆرێ گەنەی ورد کە پرگ یان کرمۆکە مشەخۆرەکانی لەژێر پێستی گیانداراندا دەژین و دەبنە هۆی dermatitis و دەتوانن scrub typhus رابگوێزن [توخم *Trombicula*] ۞ نوعی کنه

**harvest moon** *noun*

مانگی پڕ نزیکتر بە رۆژگەرانەوەی پاییز autumn equinox (22 و 23 سێپتامبر)، مانگی شەوی چاردە ۞ ماه شب چهارده

**harvest mouse** *noun*

1 مشکی کلۆش، مشکۆلەیەکی ئوراسیای باکووری، بە کلکی گیرکەرەوە [*Micromys minutus*] 2 جۆرێ مشکی شەوگەڕی ئەمریکای باکووری و ناوەندی [توخم *Reithrodontomys*: چەندین جۆرن] ۞ هاروست مون

**Harvey Wallbanger** *noun*

بەرکول یان کوکتێلێ کە لە ڤۆدکا یان جین، ئاوی پرتەقال و گالیانۆ Galliano دروست دەبێ ۞ هاروست مون

**has** = third person singular present of have

**has-been** /'hæz biːn/ *noun*

مرۆ یا شتی لەباوکەوتوو، لەکارکەوتوو، ئارەقتە، کەفتەکار، پەککەوتوو ◌ آدم یا چیز از کارافتاده

**hash**[1] /hæʃ/ = hashish

**hash**[2] /hæʃ/ *noun*

1 گووکاری 2 شتە نیمداشتەکان، شتە لەکارکراوەکان، شرەویرە ◌ 1 افتضاح 2 چیزهای مستعمل

**hash**[3] /hæʃ/ *noun*

نیشانەی # ◌ علامت #

**Hashemite** /'haʃɪmʌɪt/ *noun,* also Hashimite

ئەندامی تیرەیەکی عەرەبی کە پێیان وایە لە بەرەی هاشم بن (کە محەمەدی پێغەمبەر دەبێتە ئەدیدەی) ◌ هاشمی

**hashish** /'hæʃiːʃ, US hæ'ʃiːʃ/ *noun*

مەریوانە، چەرس، بەنگ، حەشیش ◌ حشیش

**Hasid** /'hasɪd/ *noun,* also Chasid, Chassid, or Hassid

لایەنگر یا شوێن‌کەوتەی هەسیدیزم (بنەڕەت: لە *ḥāsīd* "pious") ◌ پیرو هسیدیسم

**Hasidism** /'hæsɪdɪzəm/ *noun*

هەسیدیزم (شێوەیەکی دینی جوولەکە کە بیروباوەڕەیکی زۆر توندی هەیە، لە پۆلەند لە سەدەی 18دا دامەزرا) ◌ هسیدیسم

**haslet** /'hazlɪt, US 'heɪzlɪt/ *noun*

(زۆرتر بریتانیا) چێشتێکی سارد کە جەرگ‌ودڵ ب.ت. هی بەراز کە پەستێوراو و ورد کراوە، تیایە ◌ هازلیت

**hasn't** /'hæznt/ = has not

**hasp** /hɑːsp, US hæsp/ *noun*

1 سەرکلۆم، ئەنجانە، ئالقەڕیز، سەرکل 2 کلافەدەزوو ◌ 1 چفت 2 کلاف

**Hassid** = Hasid

**Hassidism** = Hasidism

**hassium** /'hæsiəm/ *noun*

هەسیەم، هەسیوم (توخمێکی کیمیایی، کاتێ گەردیلەکان لێک‌دەکەون، پێکدێ، بە ژ.گ. 108، ن. Hs؛ بنەڕەت: لاتینی نوێ، لە *Hassias* لاتین "Hesse"، هەرێمێکی ئەڵمانیا کە لەوێ دۆزرایەوە) ◌ هسیم

**hassle** /'hæsl/ *noun*

1 شەڕەقسە، مشت‌ومڕ، دمەدمێ، شەڕەچەلەحانێ، wrangle: *Do as you're told and don't give me any hassle!* 2 بەلا، کێشە، دژواری، کێشەمەکێش: *legal hassles* ◊ *It's a hassle having to travel with so many bags* ◌ 1 جروبحث 2 مصیبت، مشکل

**hassock** /'hæsək/ *noun*

1 ژێرچۆک، باڵنج (ژێر ئەژنۆ، ب.ت. لە کلێسە) 2 چەپکەگیا، مەلۆ، سوالە ◌ 1 تشکچە 2 دستەی علف

**hast** = archaic second person singular present of have

**hastate** /'hasteɪt/ *adjective*

(رووەکناسی، گەڵا) سێ‌گۆش و نووک‌تیژ، رمی، نێزەیی ◌ نیزەای

**haste** /heɪst/ *noun*

پەلە، لەز، دەست‌وبرد، زوو، پڕتاو، تاوەبڕکێ، خێرایی: *The letter had clearly been written in haste* ◊ *Why all the haste?* ◌ شتاب، عجلە

**hastily** / heɪstɪli/ *adverb*

بە پەلە، بە پڕتاو، بە هەشتاو، بە تاوەتڕێ، (بە) تەقڵەکوت ◌ با عجله

**hastiness** /heɪstinəs/ *noun*

پەلە، تاو، لەز، خێرایی، زوو، بەپڕتاوی، دەست‌وبردی ◌ شتاب، عجله، سرعت

**hasty** /'heɪsti/ *adjective* (hastier, hastiest)

بێ‌تاقەت، بەپەلە، تاوسەندوو، بەتاو، بەلەسە، بە لەزوبەز، خێرا، دەست‌وبرد، بەپڕتاو، زووکراو، بێ‌بیرلێ‌کردنەوە ◌ عجول، شتاب‌زده

**hat** /hæt/ *noun*

1 کڵاو، تەقیلە، شەبکە 2 پلەوپایە، پۆست، پێگە 3 هێمای رەوش یان پۆستی فەرمی کەسێ ◌ 1 کلاه 2 مقام 3 نماد موقعیت رسمی فردی

**hatband** /'hætbænd/ *noun*

زیواری دەوری کڵاو، کڵاوبەند، کڵاوبەست، چەرمی دەوری کڵاو ◌ نوار دور کلاه

**hatbox** /'hætbɒks, US -bɑːks/ *noun*

سنووقی کڵاو، قوتووی کڵاو، جێ‌کڵاو ◌ جعبەی کلاه

**hatch** /hætʃ/ *noun*

1 دەریچە، دەلاقە، کولاوکە، کلاوڕۆژنە 2 (کەشتی) درگا، دەرکە، نیوەدرگا، دەلاقە 3 (فڕۆکە و کەشتی ئاسمانی) درگا، دەرکە، درگای هەڵدراوە 4 پەنجێرە، بەرکاز ◌ 1 دریچه 2 و 3 مدخل 4 پنجره

**hatchback** /'hætʃbæk/ *noun*

ماشێنی بە درگای پشتەوە (کە هەڵدەدرێتەوە)، درگای پشتەوەی ماشێن ◌ هاچ‌بک

**hatchery** /'hætʃəri/ *noun, pl.* hatcheries

شوێنی (هێلکە)هەڵێنان، شوێنی گەرادانان یان گەراخستن، گەراگە (ب.ت. ماسییەکان) ◌ محل تخم‌ریزی

**hatchet** /'hætʃɪt/ *noun*

1 تەور، تەورۆکە، سیکارد، بیور، بفر، تەوری چکۆلە (دەسک‌کورت)، ئەژاخ 2 تەشوێ، تەشۆ، ترێشە، بووم 3 = tomahawk ◌ 1 تبر، تبرچە 2 تیشە

**hatchet face** *noun*

ڕوخسار یان دەم‌وچاوی درێژ و باریک ◌ صورت دراز و باریک

**hatchetfish** *noun, pl.* same or hatchetfishes

تەورەماسی: جۆرێ ماسی ئاوی شیرینی گەرمێنانی جیهانی نەوێ [خێزان Gasteropelecidae: چەندین جۆرن] ◊ نوعی ماهی

**hatchet job** *noun*

(بریتانیا، نافەرمی) رەخنەی توند، بەگژداچوون (بابەتێکی رۆژنامە یان بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی لەسەر کەسێ) ◊ انتقاد شدید

**hatchet man** *noun*

1 پیاوکوژ (ی بەکرێگیراو)، رەشەکوژ، بەکرێگیراو 2 رەخنەی توند، بەگژداچوون ◊ 1 مزدور، آدمکش (مزدور) 2 انتقاد شدید

**hatching** *noun*

هاشوور، تەریبەهێڵکاری ◊ هاشور

**hatchment** *noun*

تەختێ بە شێوەی لەبزینە کە چەکوچۆڵی کەسێ کە مردووە، لەسەرە (وەکوو شانازی ئەو کەسە دادەنرێ) ◊ هاچمنت

**hatchway** /'hætʃweɪ/ *noun*

دەربیجە، دەلاقە، کولاوکە، کلاورۆژنە، درگا، دەرکە، درگای دادراوە ◊ دریچە، در

**hate** /heɪt/ *noun*

1 بێزاری، رقلێبوون، خۆشنەویستن: *a strange relationship built on love and a hate campaign* ◊ *a look of hate* ◊ *hate* 2 مرۆ یان شتێ بێزەون: *Plastic flowers have always been a particular hate of mine* ◊ 1 نفرت، انزجار 2 آدم یا چیز مورد تنفر

**hateful** /'heɪtfl/ *adjective*

بێزاوی، ناخۆش، قێزەون، پیس، بێزەون، ناشیرین، کرێت، دزێو: *a hateful person/place/face* ◊ نفرت‌انگیز، زشت

**hatefully** /'heɪtfli/ *adverb*

بێزاوی‌یانە، بە شێوەیەکی قێزەون، بێزەونانە ◊ بە طور نفرت‌انگیز

**hatefulness** /'heɪtflnəs/ *noun*

بێزاویبوون، دزێوی، ناخۆشی ◊ نفرت‌انگیزی

**hath** = archaic third person singular present of have

**hatha yoga** /'hʌtə, US 'haθə/ *noun*

شێوەیێکی مەشق و راهێنانی لەشی و راگیرکردنی هەناسە لە یوگادا (بنەڕەت: لە سانسکریت "هێز force" *hatha*) ◊ هاتا یوگا

**hatless** *adjective*

بێکلاو، سەرڕووت، سەرپەتی ◊ بی‌کلاه

**hatpin** /'hætpɪn/ *noun*

دەرزی کلاو (ژنانە) ◊ سنجاق کلاه

**hatred** /'heɪtrɪd/ *noun*

بێزاری، رقلێبوون، خۆشنەویستن، ناخۆشویستن ◊ نفرت، انزجار

**hatstand** /'hætstænd/ *noun*

کلاوهەڵواسە. سنگ یان داری کلاو (هەڵواسین) ◊ کلاه‌آویز

**hatter** /'hætə(r)/ *noun*

1 کلاودروو 2 کلاوفرۆش ◊ 1 کلاه‌دوز 2 کلاه‌فروش

**hat trick** *noun*, also hat-trick

1 سێ سەرکەوتن، سەرکەوتنی سیانە 2 (تۆپێن) سێ گۆڵە 3 سێ خاڵە ◊ 1 موفقیت سه‌گانه 2 سه گله 3 سه‌امتیازه

**hauberk** /'hɔːbɜːk/ *noun*

(مێژوویی) زرێ (لە زنجیر و لە سەدەکانی نێوەڕاستدا) ◊ جوشن

**haughtily** /-ɪli/ *adverb*

لە رووی خۆبەزلزانی‌یەوە، لووتبەرزانە، ترزلانە ◊ مغرورانه

**haughtiness** /'hɔːtinəs/ *noun*

خۆبەزلزانی، لووتبەرزی، ترزلی، تروتوپ، بەفیزی، فیز، دەمار ◊ تکبر، غرور، نخوت

**haughty** /'hɔːti/ *adjective* (haughtier, haughtiest)

بەدەمار، فیزن، لووتبەرز، ترزل، خۆپێزل، ئاخوربەرز ◊ متکبر، مغرور

**haul** /hɔːl/ *noun*

1 کێشان، راکێشان، راکێشکردن 2 ماوە، مەودا 3 راو، چینەڕاو، بەرەڕاو (ئەو ئەندازەیەی ماسی‌یەی کەوا بە جارێ راو کراوە) 4 ماڵی دزراو یان دزێتی ◊ 1 عمل کشاندن 2 مسافت 3 صید 4 اجناس مسروقه

**haulage** /'hɔːlɪdʒ/ *noun*

1 راگوێستن، گوێزانەوە، گواستنەوە، بردن: *the road haulage industry* ◊ *a haulage firm/contractor* 2 کرێبار ◊ 1 باربری، حمل‌نقل 2 کرایه‌ی حمل

**haulier** /'hɔːliə(r)/ *noun*, also hauler /'hɔːlə(r)/

1 (بریتانیا) کۆمپانی راگوێستن 2 بەڕێوەبەری کۆمپانی یان دەزگای راگوێستن ◊ 1 شرکت ترابری 2 مدیر شرکت ترابری

**haulm** /hɔːm/ *noun*

کلۆش، پووش، لاسک، ساقەت ◊ پوشال، ساقه

**haunch** /hɔːntʃ/ *noun*

1 سمت، کلۆت، پاشەڵ، کنگ، کەفەڵ 2 (گۆشت) ران 3 گۆشتی قەبرغە یان کەلەکەی گاکێوی deer، گۆشتی ران و کەفەڵ 4 (سازەوانی) پایەی تاق (لای تاقێ، نێوان تاج و کۆلەکە یان دینگە؛ بنەڕەت: ئینگلیسی نێوەڕاست، لە *hanche* فەرەنسی کۆن، ئەڵمانی بنەڕەت) ◊ 1 کفل 2 ران 3 و 4 هونچ

**haunt** /hɔːnt/ *noun*

1 مەکۆ، مۆڵگە، لانە 2 خێو، تارمایی، سەهۆیر ◊ 1 پاتوق 2 شبح

**haunted** /ˈhɔːntɪd/ *adjective*
1 (ماڵ) جنۆکەلێبوو، خێوی لێیە، جنۆکاوی 2 نگەرانی، لە بیری، نگەران، نارەحەت ◌ 1 شبح‌زده، جن‌زده 2 در فکر، مضطرب

**haunting** /ˈhɔːntɪŋ/ *adjective*
لەبیرەوەنەچوو (وەکوو مێلۆدییێ) ◌ بەیادماندنی

**Hausa** /ˈhaʊsə, US -zə/ *noun, pl.* same or Hausas
هاوسا (زمانی (چادی) کە گەلی هاوسای ئەفریکا قسەی پێ‌دەکەن، ئێستا لە نایجیریە، نایجێر و بەشەکانی تری رۆژاوای ئەفریکا وەکوو زمانی پێوەندی نێوان گەلانی جیاواز بەکاردێتری) ◌ هاوسا

**haustellate** /ˈhɔːstələt, US -leɪt/ *adjective*
1 خاوەن ئەندامی مژین، مژۆکەوەر، مژۆکەدار 2 سەربە مێرووە مژۆکەکان ◌ 1 دارای آلت مکنده 2 وابسته به حشرات مکنده

**haustellum** /hɔːˈstɛləm/ *noun, pl.* haustella
(گیانەوەرناسی) ئەندامی مژین، قورتم، مژۆکە ◌ آلت مکنده

**haustorial** *adjective*
(ڕووەکناسی) مژۆکە ◌ مکنده

**haustorium** /hɔːˈstɔːrɪəm/ *noun, pl.* haustoria /-rɪə/
(ڕووەکناسی) ئەندامی مژین، قورتم، مژۆکە ◌ آلت مکنده

**hautbois** /ˈ(h)əʊbɔɪ/ *noun*
جۆری زورنا، ئۆبۆی (ئامێرێکی موسیقایە) ◌ ابوی

**haute couture** /ˌəʊt kuˈtjʊə(r), US ˌoʊt kuˈtʊr/ *noun*
1 (فەرەنسی) کۆمپانی یان دەزگا گەورەکانی داهێنانی باو (یان مۆد) 2 کەڵەباو، جل‌وبەرگی دواداب یان دوایین مۆد و باو ◌ 1 مؤسسات طراحی بزرگ مد 2 لباس‌های آخرین مد

**haute couturer** *noun*
گەورەداهێنەرانی مۆد یان باو ◌ مؤسسات طراح بزرگ مد

**haute cuisine** /ˌəʊt kwɪˈziːn, US ˌoʊt/ *noun*
1 (فەرەنسی) ئاشپەزی شایانە 2 چێشت یان خۆراکی شایانە ◌ 1 آشپزی عالی 2 غذای عالی

**haute école** /ˌəʊt eɪˈkɒl/ *noun*
خوێندنگای باڵا یا بەرز، خوێندنگای کۆتایی یا دواناوەندی ◌ دبیرستان

**hauteur** /əʊˈtɜː(r), US hɔːˈtɜːr, oʊˈt-/ *noun*
خۆبەزلزانی، لووت‌بەرزی، بەفیزی، دەمار، haughtiness ،arrogance ◌ تکبر، غرور

**Havana** /həˈvanə/ *noun*
هاڤانا (جگەرەیێ کە لە وڵاتی کوبا دروس دەکری) ◌ هاوانا

**Havdana** = Habdana

**haveli** /ˌhʌvəˈliː/ *noun, pl.* havelis
(لە هیند) سەرا، کۆشک، بەروار، کاشانە (بنەڕەت: لە *havelī* عەرەبی‌یەوە) ◌ خانه‌ی مجلل

**haven** /ˈheɪvn/ *noun*
1 پەناگە، پەنا، جێ‌پەنا، لانە، پەرێز، داڵدە، refuge 2 بەندەرگا، بەندەر، لەنگەرگا، بەندەری چکۆلە، port ،harbor ◌ 1 پناهگاه 2 بندرگاه

**have-nots** *noun, pl.*
هەژاران، نەداران، خەڵکی دەستەنگ (لە کۆمەڵگا یا وڵاتێ) ◌ فقرا

**haven't** /ˈhævnt/ = have not

**haversack** /ˈhævəsæk, US -vərs-/ *noun*
کوڵەبەن، کۆڵ، پشتەوارە، توورەکە، تێلەکە ◌ کوله‌پشتی

**haves** *noun, pl.*
دەوڵەمەندان، دارایان، دەس‌ڕۆیشتووان، سامانداران (لە کۆمەڵگا یان وڵاتێ) ◌ توانگران، ثروتمندان

**havildar** /ˈhavɪldɑː/ *noun*
(لە نیمچەوشکاری هیندوستاندا) سەرباز یان ئەفسەرێکی پۆلیس کە هاوتای sergeant ـە ◌ هاویلدار

**havoc** /ˈhævək/ *noun*
1 کاولی، خاپووری، ویرانی 2 زیانلێکەوتوویی، زەرەرمەندی، خەسارلێکەوتن: - *These insects can wreak* *oc on crops* 3 شێواوی، پاشاگەردانی، نارێکی، ناڵۆزایی ◌ 1 ویرانی 2 خسارت 3 آشفتگی

**haw**[1] /hɔː/ *interjection*
(دەنگی پێکەنین) هاها...، قاقا... ◌ هاها...

**haw**[2] /hɔː/ *noun*
1 گێوژ، گوێژ، گفیشک، بلچ، گوێشک 2 پەرژین، حەوشە، دیواربەست، دیواربەند ◌ 1 ولیک 2 پرچین، حصار

**haw**[3] /hɔː/ *noun*
سێیەمین پێڵووی چاو یان پەردەی تروکاندن لە هێندێ شیردەر یان گوان‌داردا، ب.ت. سەگ یان تیرەی پشیلە ◌ هاو

**Hawaiian** /həˈwaɪən/ *adjective, noun*
*adj* سەربە هاوایی، گەلەکەی یان زمانەکەی، هاوایی‌یی *n* زمانی هاوایی ◌ *adj* وابسته به هاوایی *n* زبان هاوایی

**Hawaiian gitar** *noun*
گیتاری هاوایی، ژێ‌یەکانی لە پۆلان ◌ گیتار هاوایی

**hawfinch** /ˈhɔːfɪntʃ/ *noun*
سەیرەگێوژە: جۆرێ سەیرەی گەورە بە دەنووکێکی زلەوە بۆ شکاندنی نێوک و دەنکی گێلاس و دانە سەختەکانی تر [تۆخم

*Coccothraustes*: سێ جۆرن] ◌ هاوفینچ

**hawk**[1] /hɔːk/ *noun*

1 باز، هەڵۆ، واشۆ، واشە، شاهین، لاچین [*Accipiter* و توخمەکانی تر، زۆر جۆرن]، (جورەباز male hawk) 2 مرۆی شەرخواز (ب.ت. سیاسەتوانی) 3 بۆ ناوی hawkmoth ـەکان بەکاردێتری، ب.ن. eyed hawk ◌ 1 باز 2 آدم جنگ‌طلب 3 هاوک

**hawk**[2] /hɔːk/ *noun*

تەختە(یەکی چوارگۆشە، دەسکێ لە ژێریەوە بۆ سواخ و هتد) ◌ هاوک

**hawkbell** /ˈhɔːkbel/ *noun*

زەنگولە (لەپێی باز یان واشودا) ◌ زنگوله

**hawk eagle** *noun*

هەڵۆباز: هەڵۆیێکی چکۆلانەی گەرمێتان، بە باڵی پان و کلکی درێژەوە [توخمەکانی *Spizaetus* و *Spizastur*: چەندین جۆرن] ◌ نوعی عقاب

**hawker** /ˈhɔːkə(r)/ *noun*

1 دیوەرە، چەرچی، دەس‌فرۆش 2 بازەوان، هەڵۆباز، واشوبەرێن، بازبەرێن ◌ 1 فروشندەی دورەگرد 2 قوش‌باز

**hawk-eyed** /ˌhɔːk ˈaɪd/ *adjective*

1 چاوتیژ، بەهەتەر، چاوباز (هەروەها eagle-eyed) 2 (کەسێ) ورد، بەسەرنج ◌ 1 دارای دید قوی 2 تیزبین

**hawking** *noun*

1 بازەوانی، بازبەرێنی، راو بە هەڵۆ یان واشو 2 کۆخە بۆ فڕێدانی بەڵغەم ◌ 1 قوش‌بازی 2 سرفه برای اخراج خلط

**hawkish** /ˈhɔːkɪʃ/ *adjective*

(سیاسەت) شەڕخواز، شەڕخوازانە، شەڕەنگێزانە (دژ dovish، hawkishly *adv*) ◌ جنگ‌طلب، ستیزگرای، جنگ‌افروزانه

**hawkishness** /ˈhɔːkɪʃnəs/ *noun*

شەڕخوازی، شەڕەنگێزی، شەڕفرۆشی ◌ جنگ‌طلبی

**hawkmoth** *noun*, also sphinx or sphinx moth

پەپوولە(شەوگەرە)بازە، بە لەنگەرە لەسەر شیلە دەنیشێ [خێزانی Sphingidae: زۆر جۆرن] ◌ نوعی پروانه

**hawk-nosed** /ˈhɔːk nəʊzd/ *adjective*

(مرۆ) لووت‌قەلانگ ◌ (شخص) با بینی قوشی

**hawk owl** *noun*

کوندەبازە، کوندەواشە (رۆژفڕی کلک‌درێژی باکووری دارستانە سنەوبەرییەکان [*Surnia ulula*]) ◌ نوعی قوش

**hawksbeard** *noun*

جۆرێ رووەک لە تیرەی daisy، شێوە dandelion، بەلام لاسکێکی لۆلقی branched stem هەیە و بە گوڵی جۆراوجۆرەوە [توخم *Crepis*] ◌ نوعی گیاه

**hawksbill turtle** *noun*

رەقە(ی دەریایی)، کیسەڵی دەریایی (لەبەر قاوغەکەی راو دەکرێ [*Eretmochelys imbricata*]) ◌ لاک‌پشت دریایی

**hawkweed** *noun*

گیاواشە، گیاباز: جۆرێ رووەک، خێزان daisy، بە سەرەگوڵی زەردی شەلەمکەرەئاساوە [توخم *Hieracium*] ◌ زاغک

**hawse** /hɔːz/ *noun*

1 بەشێ لە لووتکەی کەشتی، کە گوریس و کەندری لەنگەری پێدا تێدەپەرێ، جێ‌گوریس، کونەکەندر 2 مەودای نێوان لووتکەی کەشتی و لەنگەرەکەی ◌ هوز

**hawse hole** *noun*

کونێ لە پشتی کەشتی‌دا کە گوریس و کەندری لەنگەری پێدا تێدەپەرێ، جێ‌گوریس، کونەکەندر ◌ هوز هول

**hawser** /ˈhɔːzə(r)/ *noun*

گوریس، کەندر (پۆلایی، ئەستوور، بۆ راگرتن یان کێشانی کەشتی) ◌ طناب کلفت

**hawser-laid** = cable-laid

**hawthorn** /ˈhɔːθɔːn, US -θɔːrn/ *noun*

گڤیشک، بلچ، بلچە(سوور، زەرد و...)، گێوژ، گوێژ، گوێژ، تەنگێز، دیژەلە [*Crataegus monogyna* و جۆرە پێوەندی‌دارەکان] ◌ ولیک

**hay**[1] /heɪ/ *noun*

1 گزرە، پووش، پەلاش، هەڵیس، وشکەگیا، هەلیز 2 وینجەی وشک: *a bale of hay* ◌ 1 علف خشک 2 یونجەی خشک

**hay**[2] /heɪ/ *noun*

تەڵە، داو (راوەکەرویشک) ◌ دام

**haycock** /ˈheɪkɒk/ *noun*

تایە، تەرمەک، (تا)گزرە، گیشە، کووپە، کۆماهەلیس، تایەپووش، لۆژین ◌ کپەی کاه و علوفەی خشک

**hay fever** *noun*, also pollinosis

پووشەتێ، پووشەتا، تای پووش ◌ تب یونجه

**hayfield** *noun*

پووشەلان، پووشان ◌ های‌فیلد

**hayfork** *noun*

سیلک (sêlik)، شەنە، پووجنە، مانگێر ◌ چنگک

**hayloft** /ˈheɪlɒft, US -lɔːft/ *noun*

پووشدین، کادین، کۆتان، مەرەک ◌ انبار علف

**haymaker** /ˈheɪmeɪkə(r)/ *noun*

1 (دەزگا یان مرۆڤ) گیاوشک‌کەرەوە، گزرەکەر، وشکەنە، گیاهەڵخەر 2 (نافەرمی) مشتی کاری، مستی چاک ◌ 1 علف‌خشک‌کن 2 مشت جانانه

**haymaking** /ˈheɪmeɪkɪŋ/ *noun*

گیاوشـــــک‌کردنـــــەوە، گیاهەڵخـــــستن ◌ علف‌خشک‌کنی

**hayride** /ˈheɪraɪd/ *noun*

(زۆرتر لە ئەمریکا) سواری داشقەی پڕ لە گیا (بۆ خۆشی) ◌ هایرید

**hayseed** *noun*

دانی گیا و پووش، دانەگزرە ◌ هایسید

**haystack** /ˈheɪstæk/ *noun*, also –ymow /ˈheɪmaʊ/ or hayrick /ˈheɪrɪk/

تایە، گیشە، گزرە، تەرمەک، پووت، گرشە ◌ دستەی علف خشک

**haywire** /ˈheɪwaɪə(r)/ *adjective*

1 نارێـک، تێکـەڵوپێکـەڵ، شـێواو، تێکچـوو، ترازاو: *the radio went haywire* 2 تووڕە، لەدین‌دەرچـوو، crazy: *is going haywire with grief* ◌ 1 نابسامان، آشفته 2 عصبانی

**hazard** /ˈhæzəd, US -ərd/ *noun*

1 مەترسی، ڕیکەوت، هەڵکەوت: *a fire/safety hazard* 2 قومار، مۆرەبازی (بە دوو داش یان مۆرە) ◌ 1 خطر، تصادف 2 قمار

**hazard lights** *noun, pl.*

چـرا مەترسـی‌یـەکان، چراکـانی مەترسـی ◌ چراغ‌های خطر

**hazardous** /ˈhæzədəs, US -ərdəs/ *adjective*

1 مەترسی‌دار، پڕمەترسی: *a hazardous journey* ◊ *It would be hazardous to invest so much* ◊ *a list of products that are potentially hazardous to health* 2 هەڵکەوتی، بەبەخت، دووبەختـەکی، دووبەختی ◌ 1 مخاطره‌آمیز 2 اتفاقی

**hazardously** /ˈhæzədəsli, US -ərdəsli/ *adverb*

پڕمەترسی‌یانە ◌ بە طور مخاطره‌آمیز

**hazardous materials** = hazmat

**hazardous waste** *noun*

پاشەڕۆی مەترسی‌دار ◌ فضولات خطرناک

**haze** /heɪz/ *noun*

1 مـژی تـەنک، تـەم‌ومـژی تـۆزاوی، تۆزەتـەم، تەم‌ومژی تەنک، سووکەتەم 2 (خوازە) گێژی، شێوانی مێشکی ◌ 1 غبار 2 (مجازی) ابهام

**hazel** /ˈheɪzl/ *noun, adjective*

*n* کـەلوز، فنـدق، درەختـی فنـدق [ *Corylus avellana* و جـۆرە پێـوەنـدی‌دارەکـان]، داری کـەلوز *adj* (ڕەنـگ) قـاوەیی مەیلـەو سـوور، کەلوزی، (چاو) کاڵ، قاوەیی سـەوزڕەنگ ◌ *n* فندق، درخت یا چوب فندق *adj* قهوه‌ای مایل بە قرمز، (چشم) قهوه‌ای سبزرنگ

**hazel grouse** *noun*, also hazel hen

کوڕکـورە کـەلـوزی یـان فنـدقی [ *Bonasa bonasia*] ◌ نوعی باقرقره

**hazel-nut** /ˈheɪzlnʌt/ *noun*

میوە یان بەری دارکەلوز یا فندق ◌ میوەی فندق

**hazing** *noun*

سـەرخـستەسەر، ئـازاردان، نارەحـەت‌کـردن ◌ ایذا، اذیت

**hazmat** *noun*, also (HazMat)

مەتریاڵە مەترسی‌دارەکان، مـاک یـان کەرەسـەی مەترسی‌دار (کەترسی - کەرەسەی مەترسی‌دار) ◌ مواد خطرناک

**hazy** /ˈheɪzi/ *adjective* (hazier, haziest)

1 مژاوی، تەماوی، لێڵ، تەژمە، نادیار، ناڕوون 2 نیوەمەسـت، سـەرخۆش، گێـژ (*adv* hazily: تەماوی‌یانە، بە شێوەیەکی تەماوی؛ haziness *n*: 1 تەماوی‌بوون، نادیاری، لێڵ‌بوون 2 گێژی) ◌ 1 غبارآلود، مبهم 2 گیج

**HB** *abbreviation* Hard black

**H-bomb** *noun*

بۆمبی هایدرۆژێنی ◌ بمب هیدروژنی

**HCF** *abbreviation* highest common factor

(بیرکـاری) گـەورەترین کۆلکـە یـان فـاکتێری هاوبەش (یان ناوکۆیی) ◌ بزرگ‌ترین عامل یا مقسوم‌علیه مشترک

**he**[1] /hiː/ *pronoun, adjective, noun*

*pron* (جێناوی کـارا، سێیەم کەسـی تـاکی نێـر)، ئـەو، ئـەڤ، وی *adj* نێـر، نێرینـە، کـوڕ، پیـاو *n* گیانـەوەری نێـر یـان گـوڵ ◌ *pron* او، وی *adj* نر، پسر، مرد *n* حیوان مادە

**he**[2] *noun*

هێ، هی، ها: پێنجـەمین پیتی ئـەلفوبێی عیبری Hebrew ("h") ◌ ها، هە

**he-**

پێشگر: گیانەوەری نێر، گوڵـ نێرەـ ◌ پیشوند: جانور نر

**He** symb. the chemical element helium

**HE** *abbreviation* also H.E. 1 His or Her Excellency 2 high explosive

1 جەنابی بەڕێز 2 تەقەمەنی بەهێز ◌ 1 عـالی جناب، سرکار علیە خانم 2 مادەی منفجرەی قوی

**head** /hed/ *noun, adjective*

*n* 1 سـەر، کەلـە، کـەللە، سـەلک، مێـشک 2 (نافەرمی) سەرێشە، ژانەسەر 3 سەروو، ژوور، بان، لەسەرووی، لەژوور، پێش، لەپێش، نووک 4 ئەقڵ، فام، ئـاوەز، خـەیاڵ‌کردنـەوە، بیر، هـزر، تێگەیشتن، توانایی، بەهرە 5 بابەت، بارە، باس، مـزار 6 (heads) ڕێبـەران، سـەران 7 سـەرۆک، بەڕێوەبەر، بەڕێوەبەری خوێندنگا یان دەزگایی، گـەورە، سەرپەرشت، ڕێبـەر، سـالار، سـەردار، سـەروەر، سـەرگەورە 8 کـەس، یـەکێ، دانـە 9 (ئاژەڵ) سەر، ژمارە 10 پێشی کەشتی، سەر یان پێشەوەی کەشتی، سەرک، لووتکە 11 سەردێڕ، بەش، پشک، پارچە 12 (ڕووبار) بەشی سـەروو، کـەف 13 (ڤیدیۆ و هتد) هێد 14 (زمانـەوانی)

ناوک 15 (heads) (کوێن) شیر *adj* ناوەندی، سەرەکی ◌ *n* 1 سر، مخ 2 سردرد 3 بالا، جلو، صدر، نوک 4 عقل، تخیل، فکر، فهم، استعداد 5 موضوع، مبحث 6 سران 7 رئیس، رئیس مدرسه یا مؤسسه‌ای، مدیر، ارشد، سالار 8 نفر، دانه 9 رأس، تعداد 10 جلو کشتی، دماغه 11 سرفصل، بخش 12 (رودخانه) قسمت علیا، کف 13 هد 14 (زبانشناسی) هسته 15 (در جمع) شیر *adj* مرکزی

**-head** = equivalent to -hood

**headache** /ˈhedeɪk/ *noun*

1 ژانەسەر، سەرێشە، سەرئێشە، سەرئاسێ (ئەسپەک violent headache (دوای گرانەتا) 2 (ناڤەرمی) دەردەسەری، گێچەڵ ◌ 1 سردرد 2 مکافات

**headband** /ˈhedbænd/ *noun*

سەرپێچ، ناوچاوپێچ، ناوچاوبەست، (شیرازە = headband of a book) ◌ هدبند

**headbanger** /ˈhedbæŋə(r)/ *noun*

1 سەرلەقێن، سەرتەکاندەر، سەرراوەشێن 2 مرۆی گەوج و شێت ◌ 1 هدبانگر 2 آدم احمق و دیوانه

**headbanging** /ˈhedbæŋɪŋ/ *noun*

سەرلەقاندن، سەرتەکاندان، سەرراوەشاندن ◌ هدبانگینگ

**headboard** /ˈhedbɔːd, US -bɔːrd/ *noun*

داری سەروو یان سەری تەخت یان چرپایە ◌ چوب فوقانی تخت

**headcase** /ˈhedkeɪs/ *noun*

بنیادەمی شێت ◌ آدم دیوانه

**headchcese** /ˈhedtʃiːz/ = brawn

**headcount** /ˈhedkaʊnt/ *noun*

1 سەرژمێری، بژاردنی خەڵک (بۆ بۆنەیێ): *to do a –dcount* ◊ *What's the latest headcount?* 2 ژمارەی کەسانی ئامادە، ژمارەی ئەو کەسانەی کە بۆ کۆمپانیێ کار دەکان ◌ 1 شمارش مردم 2 آمار نفرات

**headdress** /ˈheddres/ *noun*

لەچکە، دەسماڵ، سەرووک، کڵاو، پۆتەلاک (لە بۆنەی تایبەتیدا) ◌ روسری

**headed** /ˈhedɪd/ *adjective*

(لە لێکدانا) ـسەر، ـسەرە: *a three-headed monster* ◌ (در ترکیب) ـسر

**headed notepaper** *noun*

سەرپەڕ، کاغزی مارکدار ◌ سربرگ

**header** /ˈhedə(r)/ *noun*

1 (تۆپێن) بەسەرلێدان، بە کەڵلەلێدان 2 سەرپەڕ (وەکوو نووسراوە یان ژمارە لە هەموو لاپەڕەکان) 3 لووربوون 4 سەرەنگرێ، سەرسم، نسکۆ 5 خشت یان بەردێ کە بە لای پانیەوە لەکارکرابێ ◌ 1 با سر زدن 2 هیدر 3 شیرجه 4 سکندری 5 هیدر

**head-first** *adjective*

1 بە سەر(ەوە)، بە کەڵلەوە 2 بە سەرەوە رۆیشتن 3 بەپەلە، بەپرتاو، بێبیرلێکردنەوە ◌ 1 با سر 2 افتان از سر 3 شتابزده

**headgear** /ˈhedgɪə(r), US -gɪr/ *noun*

1 سەرپۆش، هەرچیێ کە لەسەر بکرێ، 2 *protective headgear* : سەرەوانە، سەرنەر 3 سەرکەڵلە، سەرەوانە، کەڵەوانە (ی ئەسپ) کەڵوپەلی پێشەوەی کەشتی ◌ 1 سرافزار 2 کلگی 3 هدگیر

**head-hunter** /ˈhedhʌntə(r)/ *noun*

راوچی سەر، شکارچی سەر (= ئەندامی هۆزێ کە سەری دوژمنانی وەکوو سەرکەوتنێ کۆدەکاتەوە)، کەس یان دامەزاوەیێ کە بە دوای کەسانی نێوبەدەرەوە و شارەزا دەگەرێ ◌ شکاگر سر

**head-hunting** *noun*

راوی سەر، شکاری سەر، سەرەراوکێ، دۆزینەوەی کەسانی ناودار و رازیکردنیان بۆ کارکردن ◌ شکار سر

**heading** /ˈhedɪŋ/ *noun*

1 سەربەش، سەرپەڕ، سەرپاژ، سەرباس، سەرنامە: *chapter headings* 2 بەش، پشک 3 سەرپۆش، سەر، درگا، دالان 4 رەهۆڵ ◌ 1 عنوان، سرفصل، سرنامه 2 بخش 3 در 4 نقب افقی

**headland** /ˈhedlənd, US -lænd/ *noun,* also promontory

1 (زەویناسی) سەر، سەرک 2 سەرەزەوی، باریکاییەکی ئەکێلراو لە کلکەی کێڵگەدا ◌ 1 سنگپوز 2 هدلند

**headless** /ˈhedləs/ *adjective*

بێسەر، سەربراو، سەرپەڕیو: *a headless body/corpse* ◌ بدون سر

**headlight** /ˈhedlaɪt/ *noun,* also headlamp /ˈhedlæmp/

چرای پێشەوە، چرای سەر(ەکی)، چراگەورە ◌ چراغ جلو

**headline** /ˈhedlaɪn/ *noun*

سەردێر، نیونیشان، سەرپەڕ ◌ تیتر، سرصفحه

**headlines** *noun, pl.*

سەرپەیام، سەردێری هەواڵەکان، سەرنووچە، کورتەی هەواڵەکان: *Do you mind if I listen to the -nes before we leave?* ◌ سرخط اخبار

**headlock** /ˈhedlɒk, US -lɑːk/ *noun*

(زۆرانبازی) سەرگرتن: *He had him in a headlock* ◌ عمل گرفتن سر

**headlong** /ˈhedlɒŋ, US -lɔːŋ/ *adverb, adjective*

1 بە سەر، بە کەڵلە، بە سەرەوە رۆیشتن 2 بەپەلە، بەپرتاو، هەڵەشانە، سەرچڵانە، بێبیرلێکردنەوە، توند ◌ 1 با سر، افتان از سر 2 شتابزده

**head louse** *noun*
ئەسپێ یان هەبێشی سەر [ *Pediculus humanus capitis*] ◇ شپش سر

**headman** /'hedmæn/ *noun, pl.* headmen
سەرهۆز، سەرخێل، کەلانتەر، سەرگەورە، کوێخا، گزیر، پیاوماقوول (لە گوندێ) ◇ رئیس قبیله، رهبر

**headmaster** /ˌhed'mɑːstə(r), US -'mæs-/ *noun*
بەڕێوەبەری خوێندنگا ◇ مدیر مدرسه

**headmistress** /ˌhed'mɪstrəs/ *noun*
بەڕێوەبەری خوێندنگا (ژن) ◇ مدیر مدرسه

**head-money** /'hed mʌni/ *noun*
1 سەرانە (خەلاتی هێنانەوەی سەر یان گرتنی تاوانبار) 2 باجی سەرانە ◇ 1 هدمانی 2 مالیات سرانه

**headmost** /'hedməʊst/ *adjective*
(ب.ت. کەشتیی) یەکەم، لە پێشەوە، لە پێش‌تر ◇ مقدم

**headnote** *noun*
سەرتێبینی، سەرنجی سەرەوەی بابەت یان بەڵگەیێ ◇ هدنوت

**head office** /'hed ɒfɪs/ *noun*
سەرنووسینگە، نووسینگەی سەرەکی، بەڕێوەبەری ناوەندی (لە کۆمپانییێ): *Their head office is in New York* ◇ ادارهٔ اصلی

**head of state** *noun*
سەرۆکی حکومەت: *The Queen was joined by the US President and other heads of state from around the world* ◇ رئیس دولت

**head-on** *adjective, adverb*
(لێکدان) لە پێشەوە، سەربەسەر، رووبەروو، راستەوخۆ، لە رووبەڕووەوە: *a head-on crash/collision ◊ The cars crashed head-on ◊ We hit the tree head-on* ◇ شاخ‌به‌شاخ

**head-on collision** *noun*
لێکدانی لە پێشەوە (یان پێش‌بەپێش) ◇ تصادف شاخ‌به‌شاخ

**headphones** /'hedfəʊnz, US -foʊnz/ *noun, pl.*
سەرپیس، گوێ‌پیس؟، هێدفۆن: *a pair/set of headphones* ◇ گوشی

**headpiece** /'hedpiːs/ *noun*
1 تاس‌کڵاو، خوود، کڵاوزرێ، کڵاوخوود، کڵاو 2 ئەقڵ، هۆش، زیرەکی، مێشک، تێگەیشتن، 3 (کتێب) نەخش یان رازاندنەوەی سەرپەڕ یان سەرووی پەڕە ◇ 1 کلاه‌خود 2 عقل، ادراک 3 هدپیس intelligence ،brains

**headquartered** /ˌhed'kwɔːtəd, US 'hedkwɔːrtəd/ *adjective*
خاوەنی بەڕێوەبەری ناوەندی، بارەگا لە شوێنێکی تایبەتی، خاوەنی بڕیارگە، خاوەنی ناوەندی فەرمانداری یا ناوەندی سەرکردایەتی: *News Corporation is -dquartered in Sydney* ◇ دارای ادارهٔ مرکزی ستاد

**headquarters** /ˌhed'kwɔːtəz, US 'hedkwɔːrtərz/ *noun, pl.*
بەڕێوەبەری ناوەندی، بارەگا، بڕیارگە، ناوەندی فەرمانداری، ناوەندی سەرکردایەتی: *The police ◊ firm's -s is/are in London Headquarters in Dublin ◊ headquarters has/have agreed* ◇ ادارهٔ مرکزی ستاد

**head resistance** *noun*
بەرهەڵستی لە پێشەوە ◇ مقاومت جلویی

**headrest** /'hedrest/ *noun*
(کورسی) جێ‌سەر، ژێرەسەرە ◇ زیرسری

**headroom** /'hedruːm, US -rʊm/ *noun*
مەودای نێوان سەر و مێچ، مەودای پاراستن ◇ فاصلهٔ میان سر و سقف

**headsail** /'hedseɪl, US -s(ə)l/ *noun*
بادەوەی سەر دەنووک یان پێش‌ترین بەشی کەشتی، سەربادەوە، سەربایەوان ◇ هدسیل

**headscarf** /'hedskɑːf, US -skɑːrf/ *noun, pl.* headscarves
لەچکە، دەسماڵ ◇ روسری

**headset** /'hedset/ *noun*
هێدفۆن، سەرپیس ◇ هدفون

**headship** /'hedʃɪp/ *noun*
1 بەڕێوەبەرایەتی خوێندنگا 2 پۆستی بەڕێوەبەرایەتی خوێندنگا 3 سەرۆکایەتی، سەرکردایەتی، گەورەیی، پێشەوایی: *the headship of the department* ◇ 1 مدیریت مدرسه 2 مقام مدیریت مدرسه 3 ریاست

**head-shrinker** *noun*
(تافەرمی) سایکیاتریست، دەروونپزشک ◇ روان‌پزشک

**headsman** /'hedzmən/ *noun, pl.* headsmen
سەربڕ، پیاوکوژ، جەللاد ◇ جلاد

**Heads of State** *noun*
سەرانی وڵاتان ◇ سران کشورها

**headspring** *noun*
سەرچاوە، چاوکانی، سەرچاوان، بناوان، ◇ سرچشمه source ،fountainhead

**headsquare** = headscarf

**headstall** /'hɛdstɔːl/ *noun*
1 سەرکەللە، سەرەوانە، کەلەوانە 2 هەوسار، لەغاو، دەسکەرەشمە ◇ 1 کلگی 2 افسار

**headstand** /'hedstand/ *noun*
سەرسەنگی، سەرڕاوێستان ◇ بالانس

**headstander** *noun*
جۆرێ ماسی ئاوی شیرینی ناوچەی ئاریزۆنا، زۆرتر بۆ نێو ئاکواریۆم [توخم *Abramites*:

دوو جۆرن] ◌ نوعی ماهی

**head start** *noun*

لەسەرتربوون، باشی، چاکی ◌ مزیت، امتیاز

**headstay** = forestay

**headstock** *noun*

دەستە یاتاقانی bearing ماشێنێ کە بەشی سووڕان یان خولانەوە راگیر دەکا ◌ هداستوک

**headstone** /'hedstəon, US -stoon/ *noun*

(بەردی) سەرین، هەنگیز، کێل، بەردی گۆر، میل ◌ سنگ بالای قبر

**headstream** *noun*

چۆمی سەرچاوەیێ ◌ هداستریم

**headstrong** /'hedstrɒŋ, US -strɔ:ŋ/ *adjective*

(نابەسند) کەللەڕەق، لاسار، سەرسەخت، کەللەڕەقانە: *a headstrong businessman* ◌ یکدنده، خودرأی، لجوجانه

**headstrongness** /'hedstrɒŋnəs, US -strɔ:ŋnəs/ *noun*

کەللەڕەقی، لاساری، سەرسەختی، سەرکێشی ◌ یکدندگی

**head teacher** *noun*

مامۆستای بەرپرسی خوێندنگایێ ◌ معلم ارشد

**head-to-head** *noun, adjective, adveb*

*n* دانوستان یان ڕووبەڕووبوونەوەی دوو لایەن *adj, adv* دوو پارتی یان لایەن دەگرێتەوە کە ڕووبەڕوو بوونەتەوە ◌ *n* گفتوگو یا مواجهه میان دو طرف *adj, adv* دربرگیرندەی دو حزب مواجهه با همدیگر

**headturning** *adjective*, also head-turning

یەکجار سەرنجڕاکێش ◌ فوق‌العاده جذاب

**headwaters** /'hedwɔ:təz, US -tərz/ *noun. pl.*

(ڕووبار) سەرچاوە، بناوانی چۆم ◌ سرچشمه

**headway** /'hedweɪ/ *noun*

1 پێشکەوتن، پێشوەچوون 2 ئاستی چوونەپێشی کەشتی 3 بەرزایی تاق، مەودای ژوورسەر یان ژێرتاق 4 مەودای نێوان دوو قەتار یان دوو پاس لە ڕێگایەکدا ◌ 1 پیشرفت 2 میزان جلوروی کشتی 3 هدوی

**headwind** /'hedwɪnd/ *noun*

بای پێچەوانە یان بەرەوڕوو، پەرچەبا، بای ڕووبەڕوو ◌ باد مخالف

**headword** /'hedwɜ:d, US -wɜ:rd/ *noun*

سەروشە ◌ مدخل

**headwork** /'hedwɜ:k/ *noun*

1 کاری مێشکی (یان بیرکردنەوەیی)، کاری زەینی، 2 mental labour (لە کۆدا) دەزگایێ بۆ کۆنترۆڵ و ڕاگیری ڕۆیینی ئاو لە چۆم یان کەنداوێ ◌ 1 کار ذهنی 2 هدورکز

**heady** /'hedi/ *adjective* (headier, headiest)

1 بەپەلە، بێبیرلێکردنەوە، هەڵەشانە، سەرەڕۆیانە 2 (خواردنەوە) گیرا، سەرخۆشکەر، مەستکەر، بەگیر 3 وروژێنەر: *the -ady atmosphere of independence* ◌ 1 عجولانه، شتاب‌زده 2 قوی 3 هیجان‌انگیز

**healable** /'hi:ləbl/ *adjective*

سارێژ دەبێتەوە، چارەسەر دەکرێ ◌ علاج‌پذیر

**heal-all** /'hi: ɔ:l/ *noun*

دەرمانی هەموو دەردێ، نۆژدارو ◌ دوای عام

**heald** = heddle

**healer** /'hi:lə(r)/ *noun*

سارێژکەر، دەرمانکەر، چارەسەرکەر، چارەساز: *Time is a great healer*; *a faith/spiritual healer*: کات یان زەمان چارەسازی کێشەکانە) ◌ شفادهنده

**healing** /'hi:lɪŋ/ *noun*

سارێژبوونەوە، چا(ک)بوونەوە، خووزهێنانەوە، برژانەوە ◌ بهبود

**health** /helθ/ *noun*

1 سلامەتی، ساغی، لەشساغی، باشی، ساخلەمی، تەندروستی 2 باری لەش، خوو، واز ◌ 1 سلامت، بهداشت 2 حال

**health and safety** *noun*

تەندروستی و ئاسایش(ت) ◌ بهداشت و امنیت

**health care** *noun*

ئاگاداری تەندروستی ◌ مراقبت بهداشتی

**health centre** *noun*

ناوەندی پزشکی خۆجێیی ◌ بهداری منطقه

**health club** *noun*

وەرزشگا ◌ سالن ورزش

**health farm** *noun*

وەرزشگا، زۆرخانە ◌ ورزشگاه

**health food** *noun*

چێشتی سروشتی، خۆراکی سلامەت ◌ غذای بهداشتی

**healthful** /'helθfl/ *adjective*

سلامەتیهێنەر، باش بۆ سلامەتی، سازگار، تەندروست، لەشساغ ◌ فرحبخش، سالم

**healthfully** /'helθfli/ *adverb*

سلامەتیهێنەرانە ◌ به طور فرحبخش

**healthfulness** /'helθflnəs/ *noun*

باشبوون بۆ سلامەتی ◌ فرحبخش بودن

**healthily** /'helθɪli/ *adverb*

تەندروستانە، لەشساغانە: *to eat healthily* ◌ به طور سالم

**healthiness** /'helθinəs/ *noun*

ساغی، سلامەتی، لەشساغی، تەندروستی ◌ صحت، سلامتی

**health service** *noun*

ڕاژەوانی چاودێری پزیشکی، خزمەتگوزاری گشتی پزشکی ◌ خدمات بهداشتی و درمانی

**health spa** = health farm

**health visitor** *noun*
سەردانکەر یان سەردانچی تەندروستی (نەخۆشیاریکی راهاتوو کە سەری نەخۆشەکانی بدا) ◌ بازدیدکنندەی بهداشتی

**healthy** /helθi/ *adjective* (healthier, healthiest)
1 ساغ، تەندروست، سلامەت، لەشساغ، سازگار، خۆش، گەوار، شاد، بەکەیف، بەکەلک، بەسوود: *a ◊ a healthy child/animal/tree to have a ◊ healthy diet/climate/lifestyle* 2 ژیرانە، ئاسایی، باشکارکردوو: *healthy appetite It's not -lthy the way she The child showed a ◊ clings to the past* ◌ 1 سالم، بانشاط، مفید 2 *healthy curiosity* معقول، نرمال

**heap** /hi:p/ *noun*
1 کۆما، چینە، کۆگا، کۆمەڵکە، تۆپەڵکە، کەڵەک 2 بارخانە، لۆدە، لێشاو، بڕێکی زۆر، پێنخوێ ◌ 1 کپه، توده 2 یک عالمه، مقدار زیاد

**heaped** /hi:pt/ *adjective*
پڕ، سەرڕێژ، دارماڵ، مۆڵ ◌ لبریز

**heard** /hɜ:d, US hɜ:rd/ = past and past participle of hear

**hearer** /ˈhɪərə(r), US ˈhɪr-/ *noun*
بیسەر، گوێگر، گوێهدار ◌ شنونده

**hear! hear!** *interjection*
قایلم، وایە، رازیم، پێموایە ◌ موافقم

**hearing** /ˈhɪərɪŋ, US ˈhɪr-/ *noun*
1 هەستی بیستن: *◊ Her hearing is poor 2 The explosion damaged his hearing* بیستن، ژنەفتن 3 دەنگاوێژ، ماوەبڕی دەنگ، دەنگبڕ 4 دەرفەتی رادەربڕین، هەڵ یا بواری قسەکردن 5 گوێلێڕاگرتن، دادگەری، دادپرسی (بەرلە دادگەر و بنی دەستەی سوێندخۆران) ◌ 1 حس شنوایی 2 شنوایی 3 صدارس 4 فرصت اظهار نظر 5 محاکمه

**hearing aid** *noun*
بنگوێ، بنگۆهک، یاریدەدەری بیستن یا ژنەفتن، گوێیار ◌ سمعک

**hearsay** /ˈhɪəseɪ, US ˈhɪrseɪ/ *noun*
قسەلۆک، گوتگوتک، شافە، دەنگۆ، قسەوباسی سەرزار: *We can't make a decision based on hearsay and guesswork* ◌ شایعه

**hearsay evidence** *noun*
شایەتی لە ڕێگای بیستن و گێڕانەوە، گەواهی لە ڕێگای شتە بیسراوەکانەوە، ستووقی زارەکی ◌ شهادت سماعی

**hearse** /hɜ:s, US hɜ:rs/ *noun*
تەرمبەر، تەرمکێش، ئامبولانس، تەرمهەڵگر ◌ آمبولانس

**heart** /hɑ:t, US hɑ:rt/ *noun*
1 دڵ، زر، زیل 2 (پەڕین) خالی دڵ، کووپە 3 دڵ و دەروون، غیرەت، دڵوجەرگ، ویران 4 سنگ 5 ورە، دڵ، سۆز، ناودڵ، دەروون، هەست 6 نێوەڕاست، ناخ، بنک، گەوهەر، ناوەند، چەق، گرنگترین بەش، (ناو)جەرگە، کرۆک، بابەرە، کاکڵ 7 (سەوزە) نێرک ◌ 1 قلب 2 (ورق بازی) خال دل 3 دل و دماغ 4 سینه 5 جرأت، شهامت، روان، عاطفه 6 وسط، کنه، مرکز، لب 7 (سبزیجات) مغز

**heartache** /ˈhɑ:teɪk, US ˈhɑ:rt-/ *noun*
خەم، خەفەت، خوسیە، پەژارە، سوێ، کەسەر، کۆڤان، کزەی جەرگ: *the heartaches of being a parent* ◌ غم، غصه، اندوه

**heart attack** *noun*
هێرشی دڵ، راوێستانی دڵ، دڵەکێن ◌ حملەی قلبی

**heartbeat** /ˈhɑ:tbi:t, US ˈhɑ:rt-/ *noun*
ترپەی دڵ، لێدانی دڵ: *a rapid/regular heartbeat* ◌ ضربان قلب

**heartbreak** /ˈhɑ:tbreɪk, US ˈhɑ:rt-/ *noun*
دڵشکان، خەم و خەفەت، پەژارە و کەسەر، دڵشکستی، کۆست (heartbreaker *n*) ◌ دلشکستگی

**heartbreaking** /ˈhɑ:tbreɪkɪŋ/ *adjective*
خەماوی، پشتشکێن، جەرگبڕ ◌ تأسفبار

**heartbreakingly** /ˈhɑ:tbreɪkɪŋli/ *adverb*
جەرگبڕانە ◌ به طور غمانگیز

**heartbroken** /ˈhɑ:tbrəʊkən, US ˈhɑ:rtbroʊkən/ *adjective*
خەمبار، لێوبەبار، کۆستکەوتوو، پشتشکاو، broken-hearted ◌ غمگین، دلشکسته

**heartburn** /ˈhɑ:tbɜ:n, US ˈhɑ:rtbɜ:rn/ *noun*
گەدەکزێ، دڵەکزە، سووتانەوەی سەری گەدە ◌ سوزش معده

**heart disease** *noun*
نەخۆشی دڵ ◌ بیماری قلبی

**heartening** *adjective*
دڵگەرمکەر، هیوادەر، دڵخۆشکەر، ورەپێدەر ◌ امیدبخش

**hearteningly** *adverb*
دڵخۆشکەرانە، بە شێوەیەکی دڵگەرمکەر ◌ به طور امیدبخش

**heart failure** /ˈhɑ:t feɪljə(r)/ *noun*
1 ناریکی دڵ، نارەحەتی دڵ 2 وێستانی دڵ، دڵەکێن ◌ 1 نارسایی قلبی 2 سکتەی قلبی

**heartfelt** /ˈhɑ:tfelt, US ˈhɑ:rt-/ *noun*
لە ناخی دڵەوە، پڕ بەدڵ، بە داوودڵ(ەوە)، لە دڵەوە، گەرموگوڕانە: *a heartfelt apology/plea/sigh* ◌ از صمیم دل

**hearth** /hɑ:θ, US hɑ:rθ/ *noun*
1 تەرکی کووره، عەرزی کولین یان ئاگردانی دیواری، بنی کولین، پێشەوەی کولین، بەر کولین 2 ماڵ، خانوو، خێزان، وەجاخ ۞ 1 جلوی شومینه، کف شومینه 2 خانه، کانون خانواده

**hearthrug** /'hɑ:θrʌg, US 'hɑ:rθ-/ *noun*
بەرەی بەر کوورەی دیواری، رایەخی بەر کولین، مافوورەی چکۆلەی بەردەم ئاگردان ۞ قالیچەی جلوی شومینه

**heartily** /'hɑ:tɪli, US 'hɑ:rt-/ *adverb*
لەدڵەوە، پڕ بەدڵ، لە ناخی دڵەوە، سێ‌مرەکی، بەتەواوەتی، یەکجار، بەڕاستی: *heartily glad/relieved* ۞ با تمام وجود، خیلی، حقیقتاً

**heartiness** /'hɑ:tinəs, US 'hɑ:rtinəs/ *noun*
گەرموگوڕی، تین، بەپەرۆشی، تامەزرۆیی ۞ صمیمت، اشتیاق

**heartland** /'hɑ:tlænd, US 'hɑ:rt-/ *noun*
بەشی ناوەندی (لە وڵات یان ناوچەیێ)، ناوەند، چەق، گرنگ‌ترین بەشی ناوچەیێ ۞ بخش مرکزی، مهم‌ترین بخش از ناحیه‌ای

**heartless** /'hɑ:tləs, US 'hɑ:rt-/ *adjective*
بێ‌بەزەیی، بێ‌دڵ، بێ‌ڕەحم، دڵڕەق ۞ سنگ‌دل

**heartlessly** /'hɑ:tləsli, US 'hɑ:rt-/ *adverb*
دڵڕەقانە، بێ‌بەزەیی‌یانە ۞ از روی بی‌رحمی

**heartlessness** /'hɑ:tləsnəs, US 'hɑ:rt-/ *noun*
دڵڕەقی، بێ‌بەزەییتی، بێ‌ڕەحمی ۞ بی‌رحمی، سنگ‌دلی

**heart-lung machine** *noun*
دەزگای دڵ و سی (ب.ت. لە کاتی برینکاری‌دا) ۞ دستگاه قلب و ریه

**heartquake** *noun*
دڵەلەرێ، دڵەلەرزە ۞ لرزش دل

**heartrending** *adjective*
جەرگبڕ، دڵ‌چووزێن، جەرگ‌چووزێن، گورچکبڕ، یەکجار ناخۆش، دڵتەزێن، پشت‌شکێن: *a heart-rending story* ۞ دل‌خراش، جانکاه

**heartrendingly** *adverb*
جەرگبڕانە، دڵتەزێنانە ۞ به طور دل‌خراش

**heart-searching** *noun*
بەخۆداچوونەوە: *This decision came after a great deal of heart-searching* ۞ درون‌کاوی

**heartsease** /'hɑ:tsi:z/ *noun*
وەنەوشەی ڕەنگە pansy کێوی بە گوڵی زەرد و ئەرخەوانی‌یەوە [*Viola tricolor*] ۞ هرتسیز

**heartsick** /'hɑ:tsɪk, US 'hɑ:rt-/ *adjective*
(ویژەیی) دڵتەنگ، مات، دەسەوئەژنۆ، خەمبار، ماتەمبار، depressed ۞ افسرده، غمگین

**heartsickness** *noun*
دڵتەنگی، ماتی، دەسەوئەژنۆیی، کزی، خەمباری ۞ افسردگی، غمگینی

**heart-stopping** *adjective*
ورووژێنەر، ترسناک، تۆقێنەر، دڵداخەر ۞ هیجان‌انگیز، وحشتناک

**heartstrings** /'hɑ:tstrɪŋz, US 'hɑ:rt-/ *noun, pl.*
ڕەگی دڵ، هەستی بەتین، کوڵوکۆ: *pulled at his heartstrings* ۞ احساسات، عواطف

**heartstruck** *adjective*, also heartstricken
ماتەمبار، مات، دڵتەنگ، کز، پەریشان ۞ غم‌زده، محزون

**heartthrob** *adjective*
(پیاو) سەرنج‌ڕاکێش، جوانچاک (ب.ت. گۆرانی‌بێژ یان ئەکتەری، بۆ ژنان): *a Hollywood heart-throb* ۞ جذاب، تیکه

**heart-to-heart** *noun, adjective*
*n* دەردەدڵ، قسەی خۆمانە *adj* لەڕوو، بێ‌لەڕوودامان ۞ *n* درد دل *adj* رک

**heart-warming** *adjective*
ورەپێدەر، دڵگەرمکەر، دڵخۆشکەر ۞ امیدبخش، دلگرم‌کننده

**heartwood** /'hɑ:twʊd, US 'hɑ:rt-/ *noun*
دڵی دار، ناوەوەی دار، پوارتک، نێرک، نێوەڕاستی دار ۞ دل‌چوب

**heartworm** *noun*
کرمەدڵە: کرمی نیماتۆدی مشەخۆر کە دەداتە دڵی سەگ و گیانەوەرانی تر [*Dirofilaria immitis*] ۞ هرت‌ورم

**hearty** /'hɑ:ti, US 'hɑ:rti/ *adjective* (heartier, heartiest), *noun*
*adj* 1 گەرموگوڕانە، دۆستانە، گەرم، بەپەرۆشانە، تامەزرۆیانە: *a hearty welcome* 2 بەکەیف، بەگوڕ، شاد، بەتین 3 زۆر، گەلێ، گەورە 4 ساغ، سلامەت، بەهێز، ساخلەم *n* پیاوی بەتاقەت یان بەگوڕ ۞ *adj* 1 صمیمانه، مشتاقانه 2 سرزنده 3 زیاد 4 سالم، قوی *n* آدم قوی

**heat** /hi:t/ *noun*
1 گەرمی، گەرما، تین، تاو 2 هەوای گەرم 3 هەستی بەتین 4 تووڕەیی، هەڵبوون، ورووژان، تاوسەندن 5 پێشبڕکێی یان رکەبەرایەتی ئامادەکاری، پێشبڕکێی سەرەتایی 6 جەنگە، کولەکوڵ، گەرمە 7 بەکەڵی، کەڵ 8 نۆبە، نۆرە، جار ۞ 1 حرارت، گرما 2 هوای گرم 3 احساس شدید 4 خشم، برانگیختگی 5 رقابت یا مسابقه‌ی مقدماتی 6 بحبوحه 7 فحل، فحل‌شدگی 8 نوبت

**heat capacity** = thermal capacity

**heated** /'hi:tɪd/ *adjective*
1 بەتین، گەرم، بەگوڕ، گەرموگوڕ، بەتاو، لەجۆش، تاوسەندوو، داگیرساو: *a heated argument/debate* 2 تووڕە، ڕق‌هەستاو 3 ورووژاو 4 گەرم‌بوو: *a heated swimming*

*pool* (heatedly /ˈhiːtɪdli/ *adv*) ۞ 1 پرحرارت، عصبانی 2 برانگیخته 3 هیجان‌زده 4 گرم‌شده

**heat engine** *noun*
بزوێنە یان مۆتۆری گەرمی ۞ انجین هیت

**heater** /ˈhiːtə(r)/ *noun*
1 کوورە، ڕۆژینگ: *a gas heater* 2 گەرمێنە ۞ 1 بخاری 2 آب‌گرم‌کن

**heath** /hiːθ/ *noun*
1 گیاگسک، گیاگەسک، پنجک [*Erica tetralix* (گیاگەسکی گەلاچەپوڕاستی) و جۆرەکانی تر] 2 جارەگیاگسک 3 بۆ ناوی کۆمەڵێ لە پەپوولە یان پەپوولەی شەوگەڕ moth بەکاردێتری، ب.ن. small heath ۞ 1 خلنگ، بوته 2 خلنگ‌زار 3 هیت

**heathen** /ˈhiːðn/ *noun* (*pl.* same or heathens), *adjective*
*n* 1 کافر، خوانەناس (ب.ت. لە دینی ئیسلام، جوولەکە و دیانەتدا)، زەندیق، بت‌پەرست 2 (نافەرمی) کەسێکی بێ‌چاند یان بێ‌ڕەوشت 3 قەلەوقوتە، لات‌ولووت *adj* سەربە کافران (*n* /ˈhiːðndəm/ heathendom: کافری، خوانەناسی، بت‌پەرستی، زەندیقی، دیندڕی؛ *adj* /ˈhiːðnɪ/ heathenish: خوانەناسانە، زەندیقانە؛ *adv* heathenishly: کافرانە، دیندڕانە، زەندیقانە؛ heathenism *n* /ˈhiːðənɪzəm/: بت‌پەرستی، کافری، دیندڕی، زەندیقی؛ heathenness *n*) ۞ *n* 1 کافر 2 آدم بی‌فرهنگ یا بی‌اخلاق 3 لات و لوت *adj* وابسته به کافران

**heathenry** /ˈhiːðənrɪ/ *noun*
بت‌پەرستی، کافری، دیندڕی، زەندیقی ۞ کافری

**heather** /ˈheðə(r)/ *noun*
1 گیاگسک، گیاکوتەرە، گوڵنەرخەوانی [*Calluna vulgaris*] 2 (نافەرمی) هەر گیا یان ڕووەکێ لەم خێزانە (Ericaceae) ۞ خلنگ

**Heath Robinson** *noun*
دەزگای پەن و مەخسەرە یان سەیر( وسەمەرە، لە ناوی کاریکاتۆرکێشی ئینگلیسی William Heath Robinson) ۞ پر زلم‌زیمبو

**heating** /ˈhiːtɪŋ/ *noun*
سیستمی گەرمی‌پێدان، دابین‌کردنی گەرمی: *a gas -ating system ◊ What type of heating do you have? ◊ heating bills* ۞ گرمایش

**heating of combustion** *noun*
گەرمی سووتان ۞ گرمای سوختن

**heating of formation** *noun*
گەرمی پێکهێنان، گەرمای پێکهاتن، گەرمی دروس‌بوون ۞ گرمای تشکیل

**heating of fusion** *noun*
گەرمی شلەوەبوون، گەرمای تو(و)انەوە ۞ گرمای ذوب

**heating of reaction** *noun*
گەرمی کاردانەوە، گەرمای پەرچەکردار ۞ گرمای واکنش

**heating of solution** *noun*
گەرمی توانەوە ۞ گرمای انحلال

**heating of vaporization** *noun*
گەرمی هەڵماندن ۞ گرمای تبخیر

**heatproof** /ˈhiːtpruːf/ *adjective*
دژەگەرمی: *a heatproof dish* ۞ ضد گرما

**heat pump** *noun*
پۆمپی گەرمی، گەرمی‌تێر ۞ پمپ حرارت

**heat rash** /ˈhiːt ræʃ/ *noun*
گەرمەژەنە، گەرماژۆ، لیرگ ۞ عرق‌جوش

**heat resistance** *noun*
زوونەسووتاوی، خۆگرتن لە بەرامبەر گەرمی‌دا ۞ مقاومت در برابر گرما

**heat resistant** *adjective*
زوونەسووتاو، خۆگر لە بەرامبەر گەرمی‌دا ۞ مقاوم در برابر گرما

**heat-seeking** *adjective*
گەرمی‌دۆز، گەرماگەڕ (فڕۆکە، ڕاکێت و هتد) ۞ رەیاب گرمایی

**heat shield** *noun*
گەرمی‌پارێز، قاوخەگەرمی (کەشتی ئاسمانی) ۞ سپر حرارتی

**heat sink** *noun*
دەزگا یا مەتریاڵێ بۆ هەڵمژینی گەرمایێکی یەکجار زۆر ۞ هیت سینک

**heatstroke** /ˈhiːtstrəʊk, US -stroʊk/ *noun*
گەرمابردوویی ۞ گرمازدگی

**heat treatment** *noun*
چارەسەرکردن بە گەرما ۞ گرمادرمانی

**heat value** *noun*
بەها یان نرخی گەرمی ۞ ارزش گرمایی

**heatwave** /ˈhiːtweɪv/ *noun*
شەپۆلی هەوای گەرم، گڕە، سەردەمی گەرمی هەوا ۞ موج هوای گرم

**heave** /hiːv/ *noun*
1 لینەوین، بەرزکردنەوە، هەڵکێشان 2 خستن، هاویشتن، تووڕهەڵدان، حەودان 3 تەکان، گوڕم 4 (دەریا) شەپۆلاوی‌بوون 5 جێگۆڕکێی ڕەگ یان چینەکانی زەوی 6 (لە ئەسپ‌دا، زۆرتر لە کودا) هەناسەبڕکێ، هەناسەسواری، هاسکە ۞ 1 عمل بلند کردن 2 عمل انداختن 3 تکان 4 تلاطم 5 جابجایی طبقات زمین 6 نفس تنگی

**heave-ho** *noun*
(نافەرمی، the heave-ho) دەرکردن، دەرنان، لابردن، لەسەر کارلابردن، وەلانان، dismissal: *gave him the old heave-ho* ۞ اخراج، عزل

**heaven** /ˈhevn/ *noun*

حەوتخشتەکی، حەوتلادێری ۞ هفتبیتی

**heptasyllabic** /ˌheptəsɪˈlæbɪk/ *adjective*
حەوتبڕگەیی ۞ هفتهجایی

**Heptateuch** /ˈheptəˌtjuːk/ *noun*
حەوت کتێبی سەرەتای تەورات (یان پەیمانی کۆن Old Testament) ۞ هفت سفر نخست از تورات

**heptathlon** /hɛpˈtaθlɒn, US -lən/ *noun*
حەو(تە)مڵانێ، پێشبڕکێی قارەمانی ژنان کە حەوت قۆناخ دادەگرێ (بڕوانە biathlon، decathlon، pentathlon، tetrathlon و triathlon؛ heptathlete *n*) ۞ هپتاتلون

**heptavalent** /ˌhɛptəˈveɪl(ə)nt/ *adjective*
(کیمیا) حەو(ت)هاوهێز(ە)، خاوەنی حەوت هاوهێز ۞ هپتاوالنت

**heptose** *noun*
(کیمیا) هەریەک لە مۆنۆساکاریدە جۆراوجۆرەکان $C_7H_{14}O_7$، حەوت گەردیلەی کاربۆنی لە هەر گەردیکدا تیایە ۞ هپتوز

**heptyl** /ˈhɛptʌɪl, -tɪl/ *noun*
(وەک ئاوەڵناو، کیمیا) ئاماژە بە بنەڕەتێکی ئالکیل alkyl radical $C_7H_{15}$، لە هێپتان دێتەبەرهەم ۞ هپتیل

**her** /hɜː(r)/ *adjective, pronoun*
1 (ئاوەڵناوی خاوەنداری سێیەم کەسی تاکی مێ) ـەکەی، ئەو، هی ئەو 2 (جێناوی بەرکاری سێیەم کەسی تاکی مێ) ئەو، ـی ۞ مال او، به او

**Hera** *noun*, Greek *Hēra, Hērē*
هیرا (= خوشک و ژنی زیوس، شاژنی ئاسمان، میتۆلۆژی یۆنانی) ۞ هرا

**Heracles** = Hercules

**herald** /ˈherəld/ *noun*
1 راسپاردە، نێراو، پەیامبەر، جاردەر، جاڕکێش، راگەیێنەر، پێشەنگ، سەرکێش، بەرایی، سەرچەلە، جڵەودار، پێشدار، پێشڕەو: *The government claims that the fall in unemployment is the herald of economic recovery* 2 جۆرێ پەپوولەی شەوگەڕی قاوەیی بە نیشانە و خاڵی ماتەوە [*Scoliopteryx libatrix*] ۞ 1 منادی، قاصد، فرستاده، طلیعه، جلودار 2 نوعی پروانه

**heraldic** /heˈrældɪk/ *adjective*
سەربە دروشمی لەشکری یان خێزانی، سەربە دروشمناسی یان نیشانەناسی لەشکری و مێژووی خێزانە کۆنەکان (heraldically *adv*) ۞ وابسته به نشانهای نظامی یا خانوادگی

**heraldry** /ˈherəldri/ *noun, pl.* heraldries
1 دروشمناسی یان نیشانەناسی لەشکری و مێژووی خێزانە کۆنەکان 2 ئامێر و کەرەسەی هێرالدیک 3 تۆمار(کردن)ی رەچەڵەکنامە و شانازییەکان، ئالای خاوەن دروشم و نیشانی لەشکری و مێژووی خێزانە کۆنەکان 4 فەڕ و شکۆی ڕێوڕەسم یان دابودەستوور، = pageantry ۞ 1 نشانهای نظامی یا خانوادگی 2 هرالدری 3 ثبت نسبنامه و افتخارات، پرچم دارای نشانهای نظامی یا خانوادگی 4 هرالدری

**herb** /hɜːb, US ɜːrb, hɜːrb/ *noun*
1 گژوگیا، گیا، رووەک 2 گیا بۆ دەرمان، رووەکی دەرمانی 3 گیای هەزوێلە ۞ 1 گیاه 2 گیاه دارویی 3 گیاه ادویهای

**herbaceous** /hɜːˈbeɪʃəs, US ɜːrˈb-, hɜːrˈb-/ *adjective*
گیایی، رووەکئاسا، شێوەگیا ۞ علفی، گیاهی

**herbaceous border** *noun*
باخچەی گوڵ ۞ باغچهی گل

**herbage** /ˈhɜːbɪdʒ, US ˈɜːrb-, ˈhɜːrb-/ *noun*
1 گیا، گژوگیا، رووەک 2 لەوەڕ 3 لەوەڕانە، حەقی لەوەڕ (لە جێلەوەڕێکی دی) ۞ 1 علف، رستنی 2 چرا 3 هربیج

**herbal** /ˈhɜːbl, US ˈɜːrbl, ˈhɜːrbl/ *adjective*
1 رووەکی، گیایی (کە وەکوو دەرمان یان بەهارات بەکاردێترێن) 2 گیانامە (کە باسی ئەم شتانە دەکا) ۞ 1 گیاهی 2 کتاب خواص گیاهان

**herbalism** /ˈhɜːblɪzəm, US ˈɜːrbl-, ˈhɜːrbl-/ *noun*
گیاگەری، هێربالیزم (بەکارهێنانی رووەک و گیا لە بواری پزشکیدا، ب.ت. وەکوو شێوەیێکی جێگرەوەی پزشکی (بە دەوا و دەرمان) ۞ هربالیسم

**herbalist** /ˈhɜːbəlɪst, US ˈɜːrb-, ˈhɜːrb-/ *noun*, also herbist
گیافرۆش،گیاگەر ۞ عطار

**herbal medicine** *noun*
1 چارەسەرکردن بە گیا، گیاتیماری 2 دەرمانی گیایی ۞ 1 گیاهدرمانی 2 داروی گیاهی

**herbarium** /həːˈbɛːrɪəm/ *noun, pl.* herbaria /-rɪə/
1 کۆمەڵێ گژوگیای وشک 2 گیادان، گیاخانە، گیادێن ۞ 1 مجموعهی گیاهان خشک 2 گیاهدان

**herbary** *noun, pl.* herbaries
(رووەکناسی)باخچەی گژوگیا ۞ باغچهی گیاهان

**herb Christopher** *noun*
baneberry ئاسایی، گیای سەینت کریستۆفێر ۞ نوعی گیاه

**herbed** *adjective*
(چێشت) بە گیا، لە گیا، گیایی، گیای تێکراوە ۞ هربد

**herb Gerard** /ˈdʒɛrɑːd/ *noun*

(رووەکناسی) ورە elder عەرزیلە، کە جاران بۆ دەرمانی باداری gout بەکاردێنرا ۞ نوعی گیاه

**herbicidal** /ˈhɜːbɪsaɪdl, US ˈɜːrb-, ˈhɜːrb-/ *adjective*

سەربە گیاکوژ (herbicidally *adv*) ۞ وابستە به علف‌کش

**herbicide** /ˈhɜːbɪsaɪd, US ˈɜːrb-, ˈhɜːrb-/ *noun*

گیاکوژ، گیافەوتێن، بژارکوژ، بژارفەوتێن (بڕوانە pesticide و insecticide) ۞ علف‌کش

**Herbivora** *noun, pl.*

گیاخۆران، گیاخۆرەکان ۞ گیاه‌خواران

**herbivore** /ˈhɜːbɪvɔː(r), US ˈɜːrb-, ˈhɜːrb-/ *noun*

گیانەوەری گیاخۆر ۞ حیوان گیاه‌خوار

**herbiverous** /hɜːˈbɪvərəs, US ɜːrˈb-, hɜːrˈb-/ *adjective*

گیاخۆر ۞ گیاه‌خوار

**herbology** = herbal medicine 1

**herborization** /hɜːbəraˈɪˈzeɪʃn/ *noun*

گیاکۆکردنەوە (بە مەبەستی لێکۆڵینەوەیان) ۞ گردآوری گیاه

**herbose** *adjective*

پڕگیا ۞ پرگیاه

**herb Pairs** *noun*

جۆرێ گیای دارستان لە تیرەی lily [*Paris quadrifolia*] ۞ نوعی گیاه

**herb Robert** *noun, pl.* herbs Robert

geraniumی کێوی، بە گوڵی ئەرخەوانی سوورباو و گەڵا بۆن‌خۆش و سەرەخس‌ئاساوە [*Geranium robertianum*] ۞ نوعی گیاه

**herby** /ˈɜːbɪ/ *adjective* (herbier, herbiest)

پڕگیا، تایبەت‌مەندی گیای هەیە (لەباری تام یان ڕواڵەدا) ۞ پرگیاه

**Herculean** /ˌhɜːkjuˈliːən, US ˌhɜːrk-/ *adjective*

1 دژوار، گران، سەخت، چەتوون، گەورە، مەزن: *a herculean task* 2 پاڵەوان، بەهێز، پاڵەوان، بەقەوەت، ڕۆستەم‌ئاسا، هێرکلانە 3 سەربە هێرکول ۞ 1 شاق، توان‌فرسا، عظیم 2 پرزور، هرکول‌مانند 3 وابسته به هرکول

**Hercules** *noun,* Latin, from Greek *Hērāklēs*

1 هێرکول، هێراکلیس، هێرکولیز: پاڵەوانی ئەفسانەیی یۆنان، کوڕی زیوس Zeus و ئالکمێنی Alcmene، ئەو بۆ ئەو هێز و تابشتە بێوێنەی بەناوبانگە ب.ت. بۆ ئەو دوازدە ئەرک و کارەی کە لە لایەن هێراوە Hera پێی سپێردرابوو (تا بگات بە نەمری immortality) 2 چۆک‌داداو، کۆمەڵەی هێرکۆل، باکووری‌ترین کۆئەستێرە نێوان Corona Borealis و Lyra ۞ 1 هرکول 2 جاثی علی راکبتیه، برج راقص

**Hercules beetle** *noun*

قالونچەی هێرکول، جۆرێکی زۆر گەورەی rhinoceros beetle گەرمێنانی ئەمریکا [*Dynastes hercules*] ۞ نوعی سوسک

**Hercules' club** *noun*

1 گورز یان گۆپالی هێرکول 2 دارێکی چکۆلانەی درکاوی ڕۆژهەلاتی ئەمریکا، لە خێزانی jensing 3 دارێکی چکۆلانەی درکاوی باشووری ئەمریکا، لە خێزانی rue [*Zanthoxylum clava-herculis*] ۞ 1 گرز هرکول 2 و 3 هرکولز کلاب

**Hercynian** /həːˈsɪnɪən/ *adjective*

(زەوی‌ناسی) سەربە گەورەقۆناخی پێکهاتنی چیاکان لە ڕۆژاوای ئەوروپا، ڕۆژهەلاتی ئەمریکای باکووری و زنجیرەچیای ئاند، لە سەردەمانی پالیۆزۆئیکی Palaeozoic پاش‌تردا (بنەرەت: لە *Hercynia silva* لاتین، ناوی پێشووی ناوچەیێ لە کێو و کەژی دارستان‌پۆشی ناوەندی ئەڵمانیا) ۞ هیرسینین

**herd** /hɜːd, US hɜːrd/ *noun*

1 ڕەوە، ڕەمە، مێگەل، گەل، ڕان، جەلە، جەلەب: *a* ◊ *a herd of cows/deer/elephants* 2 ڕەشەوڕووتە، جەماوەر، *beef/dairy herd* خەڵک، خەڵکی کوڵان و بازاڕ ۞ 1 گله، رمه 2 عوام‌الناس

**herd-book** /ˈhɜːd bʊk/ *noun*

ڕەچەڵەک‌نامەی گیانەوەران ۞ هردبوک

**herd instinct** *noun*

(خەڵک یا گیانەوەران) غەریزەی ڕەفتار وەک زۆرینە، مێگەل‌خوازی، زگماکەی مێگەل‌دۆستی یان ڕەوەدۆستی ۞ هرد انستینکت

**herdsman** /ˈhɜːdzmən, US ˈhɜːrd-/ *noun, pl.* herdsmen

1 مێگەلەوان، ڕانەوان، مێگەلدار، مێگەل‌ڕاگر، شوان 2 (Herdsman) = Boötes ۞ گلەدار، چوپان

**Herdwick** /ˈhəːdwɪk/ *noun*

ڕەگەزی مەڕێ لە باکووری ئینگلتەرە ۞ هردویک

**here** /hɪə(r), US hɪr/ *adverb, interjection*

1 لێرە، ئێرەکانە، لە ئەمێ، وا، لەم کاتەدا، لەم وەختەدا، لەم سەروبەندەدا، لەم دەمەدا 2 لێرەم، ئامادەم ۞ 1 این‌جا، در این وقت 2 حاضر

**hereabouts** /ˌhɪərəˈbaʊts, US ˌhɪr-/ *adverb*

لەم دەوروبەرە، لەم نزیکی‌یانە، لە دەوروبەری ئێرە، لە ئەمێ‌یانە: *There aren't many houses hereabouts* ۞ در این حوالی

**hereafter** /ˌhɪərˈɑːftə(r), US ˌhɪrˈæf-/ *adverb, noun*

*adv* 1 لەمەوبەدوا، لەم کاتەوە 2 لە داهاتوو(دا) *n* ژیانی دوای مەرگ، جیهانی پەسلان ۞ *adv*

1 از حالا به بعد 2 در آینده *n* جهان آخرت

**hereby** /ˌhɪəˈbaɪ, US ˌhɪrˈbaɪ/ *adverb*
بەم شێوەیە، بەم جۆرە، لەم ڕێیەوە، لەم ڕێگاوە، بەپێی ئەم نامە یان ئەم بڕیارە ۞ بدین وسیله، به این طریق، به موجب این نامه یا حکم

**hereditability** /hɪˌredɪtəˈbɪlɪti/ = heriditability

**hereditable** /hɪˈredɪtəb(ə)l/ = heriditable

**hereditament** /ˌherɪˈdɪtəm(ə)nt, US hɪˈredɪt-/ *noun*
میرات، بەشەماوە، کەلەپوور، بۆماوە ۞ میراث، ماترک

**hereditarily** *adverb*
بۆماوانە، بە شێوەیەکی بۆماوەیی یان ودمی ۞ به طور موروثی

**hereditariness** *noun*
بۆماوەییتی، بۆماوەییبوون، ودمیبوون ۞ موروثی بودن

**hereditary** /həˈredɪtri, US -teri/ *noun*
1 ژێنێتیکی، بۆماوەیی، ودمی: *a hereditary illness/disease/condition/problem* 2 میراتی، کەلەپووری (پۆست، ناو و هتد کە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر مابێتەوە): *a hereditary title/monarchy* ۞ 1 ارثی 2 موروثی

**hereditary characteristics** *noun, pl.*
تایبەتمەندییە بۆماوەیی یان ژێنێتیکییەکان ۞ خصوصیات ارثی

**heredity** /həˈredəti/ *noun* (*pl.* heredities), *adjective*
*n* بۆماوە، بۆمانەوە، ژێنێتیک، *adj* inheritance بۆماوەیی، ژێنێتیکی (بنەڕەت: لە *hereditas* لاتین "heirship"، لە *hered- heres* ("heir") ۞ *n* وراثت *adj* ارثی

**Hereford** /ˈherɪfəd/ *noun*
هێریفۆرد: ئاژەڵێکی لە نژادی وڵاخی گۆشتی سوور یان سپی (بنەڕەت: لە ناوی *Hereford* لە ڕۆژاوای ناوەندی ئینگلتەرە) ۞ هرفورد

**herein** /ˌhɪərˈɪn, US ˌhɪrˈɪn/ *adverb*
لێرەدا، ل ڤێرێ، لەم حەنە، لەم حاندە، لەم جێگایەدا، لەم شوێنە، لەم حاستە: *Neither party is willing to compromise and herein lies the problem* ۞ در این جا

**hereinafter** /ˌhɪərɪnˈɑːftə(r), US ˌhɪrɪnˈæf-/ = hereafter

**hereof** /ˌhɪərˈɒv, US ˌhɪrˈʌv, -ˈɑːv/ *adverb*
1 لەم 2 لەم بارەوە، لەم ڕووەوە ۞ 1 از این 2 در این باره

**Herero** /həˈreːrəʊ, -ˈɪərəʊ/ *noun, pl.* same or Hereros
1 ئەندامی گەلێ کە لە نامیبیا Namibia، ئانگۆلا Angola و بۆتسوانا Botswana دەژین 2 زمانی بانتۆیی ئەم گەلە ۞ هررو

**heresiarch** /hɛˈriːziɑːk/ *noun*
دامەزرێنەری بیدعەت یان ڕێبەری تیرەیەکی جیابیران ۞ بنیان‌گذار بدعت یا رهبر فرقه‌ای از بدعت‌گذاران

**heresy** /ˈherəsi/ *noun, pl.* heresies
بیدعەت، لەدینلادان، لەئاییندلادان، جیاباوەڕی، هەڵگەڕانەوە، بادانەوە، جیابیری، جودابیری: *the heresies of the early Protestants* ۞ بدعت، ارتداد، دگراندیشی

**heretic** /ˈherətɪk/ *noun*
بیدعەتدانەر، لەدینلاداو، لەئاییندلاداو، جیاباوەڕ، هەڵگەڕاوە، جیابیر، جودابیر ۞ بدعت‌گذار، مرتد، دگراندیش

**heretical** /həˈretɪkl/ *adjective*
جیاباوەڕانە، لەدینلاداوانە، لەئاییندلاداوانە، هەڵگەڕاوانە: *heretical beliefs* (heretically *adv*: جیاباوەڕانە، لە ڕووی جیاباوەڕییەوە، جیابیرانە) ۞ بدعت‌گذارانه

**hereto** /ˌhɪəˈtuː, US ˌhɪrˈtuː/ *adverb*
بەم (نامە یا بەڵگە): *Please see the policy hereto appended* ۞ به این (سند)

**heretofore** /ˌhɪətuˈfɔː(r), US ˌhɪrt-/ *adverb*
(ماف یان فەرمی) تائێستا، لەوەپێش، پێشتر، جاران، لەمەوبەر، hitherto ۞ تاکنون، سابقاً

**hereupon** /ˌhɪərəˈpɒn, US ˌhɪrəˈpuːn/ *adverb*
(ویژەیی) دوای ئەمە، پاش ئەمە، لەمەودوا، لەمەوپاش، دەسبەجێ، لەڕێوە ۞ پس از این، از این پس، بلافاصله

**herewith** /ˌhɪəˈwɪð, -ˈwɪθ, US ˌhɪrˈw-/ *adverb*
1 لەگەڵ ئەم (نامە یان بەڵگە): *I enclose herewith a copy of the policy* 2 = hereby ۞ با این نامه یا سند، به پیوست

**heriot** /ˈherɪət/ *noun*
باجێ کە دوای مەرگی tenant دەدرێ بە لۆرد ۞ هریوت

**heriditable** /ˈherɪtəbl/ *adjective*
1 بۆماوەیی 2 بەشبەر، میراتبەر (heritability /ˌherɪtəˈbɪlɪti/ *n*: هێریتەبیلیتی؛ hereditably *adv*) ۞ 1 موروثی 2 وارث

**heritage** /ˈherɪtɪdʒ/ *noun*
1 میرات، بۆماوە، کەلەپوور، بەشەماڵ، بەش، یادگار: *Spain's rich cultural -ge* 2 بەش، پشک 3 گەلی هەڵبژاردەی خودا (گەلی ئیسرائیل یان کلێسەی کریستانیەت) ۞ 1 میراث 2 سهم 3 ملت برگزیده‌ی خدا

**heritor** = heir

**herm** /hɜːm/ *noun*

ستوونی بەردینی چوارگۆشە کە سەرێکی داتاشراوی (ب.ت. هێرمێس Hermes) بەسەرەوەیە، لە یۆنانی کۆندا وەکوو نیشانەیەکی سەرسنوور یان نیشانەڕێ‌یێ دادەنرا ۞ هرم

**Hermaphroditus** *noun*, Latin, from Greek *Hermaphroditos*

کوڕی هێرمێس و ئافرۆدیت Aphrodite، کاتی خۆشتن لە پەری یان حۆری‌یێ دەکەوێ و دەبنە لەشێ و وەک نێرەمووک وێنا دەکرێن (فەرەنسی *Hermēs + Aphroditē*) ۞ هرمافرودیتوس

**hermaphrodite** /hɜːˈmæfrədaɪt, US hɜːrˈm-/ *noun, adjective*

*n* مرۆ یان گیانەوەری نێرەمووک *adj* نێرەمووک، نەنێرنەمێو، هەرمک، دووڕەگەزە ۞ *n* موجود دوجنسه *adj* دوجنسه

**hermaphroditic** /həˌmæfrəˈdɪtɪk/ *adjective*

نێر(ە)مووک، نەنێرنەمێو، هەرمک، دووڕەگەزە ۞ دوجنسه

**hermaphroditism** /hɜːˌmæfrəˈdaɪtɪzəm/ *noun*

نێرەمووکی، نەنێرنەمێوی، دووڕەگەزی ۞ دوجنسی، نرمادگی

**hermeneutic** /ˌhɜːməˈnjuːtɪk, US ˌhɜːrməˈnjuːtɪk, -ˈnuː-/ *adjective*, also hermeneutical

(تەکنیکی) ڕاڤەیی، لێکدانەوەیی، شیکردنەوەیی، هێرمێنیۆتیک، interpretative (hermeneutically *adv*) ۞ تأویلی

**hermeneutics** /ˌhɜːməˈnjuːtɪks, US ˌhɜːrməˈnjuːtɪks, -ˈnuː-/ *noun, pl.*

زانستی ڕاڤە یان لێکدانەوە، زانستی هێرمێنیۆتیک، لێکۆڵینەوەی بنەما میتۆدۆلۆژیکەکانی لێکدانەوە (وەک هی کتێبی پیرۆز)؛ ڕێباز یان ڕێچکە یان بنەما و پرینسیپی لێکدانەوە (بنەڕەت: لە *hermēneutikos* یۆنانی، لە *hermēneuein* "لێکدانەوە") ۞ علم تأویل

**Hermes** *noun*, Latin, from Greek *Hermēs*

نێردراوی خودا، خێوی ڕێگاوبان، کارداری، زمانڕەوانی، داهێنان و ڕاوڕووت (دزی) لە میسۆلۆژی یۆنانی‌دا) ۞ هرمس

**Hermes Trismegistus** *noun*, from Greek *Hermēs trismegistos*

نووسەری ئەفسانەیی کارە کیمیاگەری، ئەستێرەبینی و جادوویی‌یەکان ۞ هرمس تریسمگیستوس

**hermetic** /hɜːˈmetɪk, US hɜːrˈm-/ *adjective*

کیپ(کراو)، هەوانەداو، باش‌داخراو، سەربەست، سەرنراوە، تەواوچەسپیو ( hermetically /-kli/ *adv*: هەوانەداوانە، کیپانە) ۞ هوابندی‌شده

**hermit** /ˈhɜːmɪt, US ˈhɜːrmɪt/ *noun*

لاتەریک، گۆشەگیر، دوورەپەرێز، وشکەسۆفی ۞ معتکف

**hermit crab** *noun*

(گیانەوەرناسی) قرژاڵە لاتەریکە [زوورخێزانی Paguroidea: زۆر جۆرن] ۞ نوعی خرچنگ

**hermitess** *noun, fem.* hermit

لاتەریک، گۆشەگیر، وشکەسۆفی، دوورەپەرێز (ژن) ۞ معتکف

**hermitic** /həˈmɪtɪk/ *adjective*, also hermitical /həˈmɪtɪkl/

گۆشەگیری‌یانە ۞ وابسته به اعتکاف

**hermittage** /ˈhɜːmɪtɪdʒ, US ˈhɜːrm-/ *noun*

خانەقا، خانەی گۆشەگیران، کونجی گۆشەگیری ۞ عزلتگاه

**hermit thrush** *noun*

ڕەشێشەیەکی چکۆلەی کۆچەری ئەمریکای باکووری، جێی سەرنجە لەبەر خۆشی دەنگی [*Catharus guttatus*] ۞ نوعی پرنده

**hermodactyl** *noun*

(ڕووەکناسی) سوورنجان، سۆرنجان ۞ سورنجان

**hernia** /ˈhɜːniə, US ˈhɜːrniə/ *noun, pl.* hernias or herniae /-niiː/

(لاتین) هێرنیا، قۆڕی، فیتق، گەدوەڵ، پسان (herniated *adj*) ۞ فتق

**hernial** /ˈhɜːniəl, US ˈhɜːrniəl/ *adjective*, also herniary

هێرنیادار، قۆڕ، گەدوەڵی ۞ فتق‌دار

**herniation** *noun*

قۆڕبوون، گەدوەڵی ۞ فتق‌داری

**hero** /ˈhɪərəʊ, US ˈhɪroʊ, ˈhiː-/ *noun, pl.* heros

قارەمان، پاڵەوان، نەبەرد، کەوان، دەسکەلا، قارەمانی چیرۆک، هەڵبەست، شانۆنامە، فیلم، کتێب و هتد: *one of the country's national heroes* ۞ قهرمان، قهرمان داستان، شعر و نمایش‌نامه، فیلم، کتاب و ...

**Hero** *noun*, Latin, from Greek *Hērō*

هێرۆ: قەشەژنی ئەفسانەیی ئافرۆدیت، گراوی Leander ۞ هرو

**heroic** /həˈrəʊɪk, US -ˈroʊ-/ *adjective*

1 قارەمانانە، پاڵەوانانە، ئازایانە، کەلانە، شێرانە، قارەمانی، پاڵەوانی 2 (بەیکەر و هتد) گەورەتر لە ئەندازەی سروشتی ۞ 1 قهرمانانه، حماسی 2 بزرگ‌تر از مقیاس طبیعی

**heroic age** *noun*

سەردەمی قارەمانیتی یان پەڵەوانیتی (باش شەڕی ترۆی و پاشهاتەکانی) ۞ دوره‌ی حماسی

**heroically** /-kli/ *adverb*

قارەمانانە، پاڵەوانانە، نەبەزانە ◌ قهرمانانه
**heroic couplets** *noun, pl.*
دووخشتەکی، مەسنەوی (پاڵەوانی) ◌ مثنوی
**heroics** /hə'rəʊɪks, US -'roʊ-/ *noun, pl.*. also heroic verse
1 قارەمانبازی، خۆهەڵکێشان، پەڵەوانبازاری، قارەمانگەری 2 دووخشتەکی، مەسنەوی (پاڵەوانی) ◌ 1 آرتیستبازی 2 مثنوی
**heroin** /'herəʊɪn, US -roʊ-/ *noun*
هێرۆیین $C_{21}H_{23}NO_5$ (لە مۆرفین دروست دەکرێ و زۆرتر بە ناقانوونی وەک دەرمانی سڕکەر بەکاردێ؛ **heroinism** *n*) ◌ هروئین
**heroine** /'herəʊɪn, US -roʊ-/ *noun, fenm* of hero
قارەمان، پاڵەوان (ژن): *Shakespeare's heroines ◊ the heroines of the revolution ◊ The heroine is played by Demi Moore* ◌ قهرمان
**heroism** /'herəʊɪzəm, US -roʊ-/ *noun*
قارەمانی، قارەمانێتی، پاڵەوانی، ئازایەتی، نەبەزایەتی، شێرانەیی ◌ دلاوری، شجاعت، دلیری
**heron** /'herən/ *noun*
(باڵندەناسی) شاهۆ، شینەشاهۆ، سۆرەوێلک، شاف، بزنلەڕ، خەمخۆرە، خەمەخۆرە، شاوەشینکە [*Ardea cinerea*] (یۆرەکەی) و جۆرەکانی تر، خێزان [Ardeidae] ◌ حواصیل، بوتیمار
**heronry** /'herənrɪ/ *noun, pl.* heronries
ژینگە یان شوێنی جووتگرتنی شینەشاهۆکان ◌ زیستگاه حواصیل
**hero-worship** /'hɪərəʊ wɜːʃɪp/ *noun*
قارەمانپەرستی، پاڵەوانپەرستی ◌ قهرمانپرستی
**hero-worshiper** *noun*
قارەمانپەرست، پاڵەوانپەرست ◌ قهرمانپرست
**herpes** /'hɜːpiːz, US 'hɜːrp-/ *noun*
(پزشکی) هێرپیز، ئاگرە، تێمیسک، زۆنا (لەسەر پێست ب.ت. ئەندامانی سێکسی؛ **herpetic** *adj*) ◌ تبخال
**herpes simplex** *noun*
هێرپیزی سادە یان بێژان، تێمیسکی سادە، ئاگرە یان زۆنای سادە، هەر دوو نەخۆشی کە بە هۆی species Human herpesvirus *Human herpesvirus 1 and Human herpesvirus 2* ی تۆخمی *Simplexvirus*) تووش دەبن ◌ تبخال معمولی
**herpesvirus** /'hɜːpiːzˌvʌɪrəs/ *noun*
هەریەک لە دەستەیێ لە ڤایرۆسەکانی DNA کە دەبنە هۆی هێرپیز و نەخۆشییەکانی تر ◌ هرپزویروس
**herpes zoster** /ˌhɜːpiːz 'zɒstə(r), US ˌhɜːrpiːz 'zɑːstər/ *noun*, medical name for shingles
**herpet(o)-** *prefix*
پێشگر: خشان، خزین، خشۆکەکان، خشۆک (بنەڕەت: لە *herpeton* یۆنانییەوە "خشۆک") ◌ پیشوند: خزیدن، خزندگان، خزنده
**herpetological** /hɜːpətə'lɑːdʒɪkl/ *adjective*, also herptologic
خشۆکناسییانە، سەربە یان پێوەندمەند بە خشۆکناسی ◌ خزندەشناختی
**herptologist** /hɜːpətə'lɑːdʒɪst/ *noun*
خشۆکناس ◌ خزندەشناس
**herpetology** /ˌhɜːpɪ'tɒlədʒɪ/ *noun*
خشۆکناسی ◌ خزندەشناسی
**herptile** /'hɜːptʌɪl/ *noun*
گیانەوەری خشۆک یان وشکاوەکی ◌ هرپتیل
**Herr** /heː, German her/ *noun, pl.* Herren /'her(ə)n/
(ئەڵمانی) کاک، بەڕێز ◌ آقا
**Herrenvolk** /'her(ə)nˌfɒlk/ *noun*
گەلی ئەڵمانی کە لە لایەن نازییەکانەوە وەک ڕەگەزی سەرتر دادەنرا (لە ئەڵمانییەوە "master race") ◌ هرنولک
**herring** /'herɪŋ/ *noun*
ماسییێکی خۆراکی [*Clupea harengus*] (ئەتلانتیکی باکووری) و جۆرەکانی تر، خێزان [Clupeidae]: *fresh ◊ pickled herrings ◊ shoals of -ring ◊ herring fillets* ◌ شاه‌ماهی
**herringbone** /'herɪŋbəʊn, US -boʊn/ *noun*
1 نەخشی چەڵەمەیی یان دووفلیقانەیی، نەخشی چەپوڕاست، نەخشی مشاری یان چەوتوهەشت 2 (سکیوانی) شێوازی هەڵگەڕان بە تەلان و لێژیکا بە ڕیگارەوی ◌ 1 طرح جناغی 2 هیرینگ بون
**herring gull** *noun*
(باڵندەناسی) ماسیگرەی زێوین (لە خێزانی gull لە ئەتلانتیکی باکووری [*Larus argentatus*]) ◌ کاکایی نقره‌ای
**Herrnhuter** /'heːnhuːtə, US 'heːr(ə)n-/ *noun*
ئەندامی کلێسەیێکی مۆراڤیا ◌ هرنهوتر
**hers** /hɜːz, US hɜːrz/ *pronoun*
(جێناوی خاوەنداری، سێیەم کەسی تاکی مێینە) هی ئەو، ـی ئەو، ـەکەی ◌ مال او
**herself** /hɜː'self, weak form hə'self, US hɜːr's-, hər's-/ *pronoun*
1 (جێناوی گەڕانەوەیی، سێیەم کەسی تاکی مێینە) خۆی، لە خۆی، بە خۆی 2 (جێناوی جەختی) بە خۆی، خودی خۆی ◌ 1 (ضمیر انعکاسی) خودش را، به خودش، از خودش 2 (ضمیر تأکیدی) خودش
**hertz** /hɜːts, US hɜːrts/ *noun*

هێــرتس، هێرتــز (یەکــەی پێــوانی لــەرە (frequency) و شـەپۆلە دەنگییەکان، بەرامبەر بە سوور یان خول لە چرکەدا؛ بنەڕەت: لە ناوی فیزیکزانی ئەڵمانی Heinrich Rudolf Hertz (1857-1894) ◌ هرتز

**Herzegovinian** /ˌhɛːtsəˈɡɒvɪnɪən/ *adjective, noun*

*adj* سەربە هێرزێگۆڤینا *n* خەڵکی ناوچەی باڵکانی هێرزێگۆڤینا ◌ *adj* وابسته به هرزگوئین *n* اهل هرزگوئین

**he's** /hiːz/ *abbreviation* he is, he has

**heshvan** = Hesvan

**hesitancy** /ˈhezɪtənsi/ *noun*, also hesitance

دوودڵــی، دڕدۆنگــی، شــک، گــیر، گومــان، بەگومانی، نادڵنیایی: *I noticed a certain hesitancy in his voice* ◌ تردید، عدم اطمینان

**hesitant** /ˈhezɪtənt/ *adjective*

دوودڵ، دڕدۆنگ، بەشک، بەگومان، نادڵنیا: *a - esitant smile* (*hesitantly* /ˈhezɪtəntli/ *adv*: بە دڕدونگی(یەوە) دوودڵانە) ◌ مردد، نامطمئن

**hesitatingly** *adverb*

بە دوودڵییەوە ◌ از روی تردید

**hesitation** /ˌhezɪˈteɪʃn/ *noun*

1 دوودڵی، دڕدۆنگی، شک، گومان، گیر: *She agreed without the slightest heisitation* 2 زمانگیری، گیری ◌ 1 تردید، شک، مکث 2 لکنت

**hesitative** /ˈhezɪteɪtɪv/ *adjective*

1 دوودڵ، دڕدۆنــگ 2 دڕدۆنگــییانــە، بــە دڕدۆنگییەوە، لەگەڵ دڕدۆنگی ◌ 1 مــردد 2 تردیدآمیز

**Hesperia** /hesˈpɪrɪə/ *noun*

ڕۆژاوا، خۆراوا ◌ باختر

**Hesperian** /heˈspɪərɪən/ *adjective*

1 (میــسۆلۆژی یۆنــانی) ســەربە Hesperides، کۆمەڵێ لە پەری یان خێوەکان کە باخی سێوە زێڕینەکانیان لە دوورترین بەشی ڕۆژاوادە پاراست 2 ڕۆژاوایی، خۆراوایی ◌ 1 هــسپرین 2 باختری

**Hesperides** /hesˈperədiːz/ *noun, pl.*, Latin, from Greek

هێسپێریدیس، پارێزەرانی باخە سێوی زێڕین ◌ هسپریدس

**hesperidin** *noun*

هێسپێریدین: گلایکوسایدی glyciside بلووڕین (کریــستاڵی) $C_{28}H_{34}O_{15}$، لــە زۆربــەی میــوە ترشەکاندا هەیە، ب.ت. توێکڵی پرتەقاڵ (یان لیمۆترش) ◌ هسپریدین

**hesperidium** /ˌhɛspəˈrɪdɪəm/ *noun, pl.* hesperidia /-dɪə/

تووێــێ کــە توێکــڵی چــەرمینــەی هــەبێ (وەک پرتەقاڵ) ◌ هسپریدیوم

**Hesperus** /ˈhespərəs/ *noun*, also Hesper

(ئەستێرەوانی) ئەستێرەی شێو(ان) ب.ت. ناهید ◌ ستارەی شام، زهره

**hessian** /ˈhesiən, US ˈheʃn/ *noun*

1 پارچــەی زبــر، پارچــەی تــەلیس (و توورەکــە دروستکردن 2 لە *Hesse* هــەرێم یــان شــارێکی ڕۆژاوای ئەڵمانیا) ◌ پارچەی گونی

**Hessian boot** *noun*

چەکمەی درێژ ◌ چکمەی بلند

**Hessian fly** *noun*

مێرووێکی گەنمخۆر [*Mayetiola destructor*] ◌ حشرەی گندمخوار

**hest** *noun*

دەســتوور، فــەرمان (شــێوەی کــۆنی behest؛ ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ امر

**Hestia** *noun*, Greek

هێستیا: خواژنی خێزان یان کوانوو، و خواژنی سەرەکی چاڵاکی نیومال، لە میسۆلۆژی یۆنانیدا، بروانە Vesta ◌ هستیا

**Hesvan** /ˈhɛsv(ə)n/ *noun*, also Heshvan

(لە ساڵنامەی جوولەکەدا) هێشڤان، هێسڤان: مانگی دووەمی نادینی و مانگی هەشتەم بەپێی ساڵی دینی (بنەڕەت: لە *ḥešwān* عیبری) ◌ هسوان

**hetaera** /hɪˈtɪərə/ *noun*, also hetaira /-ˈtʌɪrə/ *pl.* hetaeras or hetaerae /-ˈtɪəriː/ or hetairas or hetairai /-ˈtʌɪrʌɪ/

قاحبە، ژنی حیز، بەستۆک ◌ فاحشە

**heter(o)-** /ˈhetərəʊ-, US -roʊ/ *prefix*

پێشگر: ئەویدی، ئەویتر، تر، هی تر، دژ، جیا، جودا، جیاواز: *heterosexual* (بنەڕەت: لە *heteros* یۆنانییەوە "other") ◌ پیشوند: دگر، ضد، کژ

**heteroatom** *noun*

جیاگەردیلە، جیانەتۆم: گەردیلەیێ بێجگەلە کاربۆن لە ئاڵقەی ناوێتەیێکی heterocyclic دا (heteroatomic *adj*) ◌ دگراتم

**heteroauxin** = indoleacetic acid

**heterocentric** *adjective*

جیانــاوەنــد: ئــەو کرۆمــۆزۆم یــان کرۆمانیــدە دووناوەندییانە کە سێنترۆمێرەکانیان بەرامبەر نین ◌ ناجورمرکز

**heterocercal** /ˌhɛtərəʊˈsəːkəl/ *adjective*

(گیانەوەرناســی، کلکــی ماســی) جیاکلــک، (*n* heterocercality: هێتێرۆســــێرکال جیاکلکێتی، جیاکلکی؛ بنەڕەت: لە -hetero + *kerkos* یۆنانی "کلک tail") ◌ هتروسرکال

**heterochain** *noun*

جیازنجیری ◌ دگرزنجیری

**heterochromatic** /ˌhɛt(ə)rəʊkrəˈmatɪk/ *adjective*

جیاڕەنگ، ڕەنگاوڕەنگ، جۆراوجۆر ◌ رنگارنگ

**heterochromatism** *noun*

جیـارەنگی، رەنگـاورەنگی، جۆراوجـۆری ◌ رنگارنگی

**heterochromatic** *adjective*
جیارەنگیینـەیی، سـەربـە هێتێرۆکرۆمـاتین ◌ وابسته به هتروکروماتین

**heterochromatin** *noun*
جیارەنگیینە، هێتێرۆکرۆماتین: بەشێکی چڕ و یەکجار رەنگهەڵگری stainable کرۆمۆزۆمێ ◌ هتروکروماتین

**heterochromosome** *noun*
کرۆمـۆزۆمی رەگـەزی sex chromosome، جیـاکرۆمۆزۆم، جیـارەنگـینتـەن (= ئـەم کرۆمۆزۆمانە لە دیاریکردنی رەگەزی نێر و مێ کاریگەرن و بە شێوەی جووت دەردەکەون و لەباری پێکهاتە و کارەوە لەگەڵ کرۆمۆزۆمەکانی تر جیاوازییان هەیە) ◌ هتروکروموزوم

**heterochromous** *adjective*
جیارەنـگ، خـاوەنی چـەنـدین رەنگـی جیـاواز، رەنگاورەنگ ◌ رنگارنگ

**heterochthonous** *adjective*
بێگانە، بیانی، دەرەکی، بۆتـە هـاوولاتی ولاتێکی تر، نارەسەن ◌ غیربومی

**heteroclite** /ˈhɛt(ə)rə(ʊ)klʌɪt/ *adjective* (also heteroclitic or heteroclitical), *noun*
*adj* ناپێوانەیی، نائاسایی، رێزپەڕ *n* 1 کەسێک یان شتێکی نائاسایی 2 ناوی نائاسایی (ب.ت. ناوێکی یۆنـانی یـان رۆمـی) ◌ *adj* سـماعی، غیرمعمـولی *n* 1 آدم یـا چیـز غیرمعمـولی 2 اسـم بی‌قاعده

**heterocrine** *djective*
(رژێنەکان) خـاوەنی هـەر دوو دەردانی دەرەوە و نێوەوە ◌ هتروکرین

**heterocyclic** /ˌhɛt(ə)rə(ʊ)ˈsʌɪklɪk, US -ˈsɪklɪk/ *adjective*
جیابازنە، جیائالقە، ئالقەجیاواز، بازنەجیاواز ◌ دگرحلقه

**heterocyst** *noun,* also boundary cell
جیـاکیـسـە، جیـاتوورەکـە، خـانـەی سـنووری یـان سـەرسـنوور: جـۆرێ خانـەی گـەورەی دیـوارەئـەستووری روونی بێ‌رەنـگ کـە لـە لاسـکەی filament هێنـدێ cyanobacteria دا دۆزراوەتەوە و شوێن یان ناوەندی چەسپاندنی نایترۆژێنە ◌ ناجورکیسه

**heterodox** /ˈhetərədɒks, US -dɑːks/ *adjective*
1 پەسندنەکراو (لەگەڵ ستانداردەکانی باوەڕێ یـان گروپێکـی تایبـەتی‌یـەوە، ب.ت. دیـن) 2 باوەڕجیـاواز، جیابـاوەڕ، جـودابیر، جیاڕێبـاز (بڕوانـــــە orthodox و unorthodox) ◌ 1 نامتعارف 2 کژآیین

**heterodoxy** /ˈhetərədɒksɪ, US -dɑːksɪ/ *noun, pl.* heterodoxies
جیابـــاوەڕی، باوەڕجیـــاوازی، جیـاڕێبــازی، جیادینی، جیائایینی، لەئایین‌لاداوی ◌ کژکیشی، کژآیینی، بدعت

**heteroduplex** *noun, adjective*
گـەردیکی nucleic-acid (وەک DNA) کـە لـە دوو زنجـیرە پێکهـاتووە کـە هـەرکامیـان لـە گەردیکی دایکەی جیاوازەوە بەرهەم هاتوون ◌ هترودوپکلس

**heterodyne** /ˈhɛt(ə)rə(ʊ)dʌɪn/ *adjective*
(ئێلیکترۆنیـک) هێتێرۆداین: سـەربـە یـان ئاماژە دەکـا بـە بـەرهـەمهێنـانی لـەرەیێکـی خـوارتر بـە لێکدانی دوو لـەرەی سـەرتر، وەک لـە پێوەنـدی رادیۆیی‌دا بەکاردێتری ◌ هترودابن

**heteroecious** *adjective*
فرەهـاوخوان، چـەنـدهاوخوان ◌ هترواسـیوس، چندمیزبانه

**heteroeciously** *adverb*
چـــەندهاوخوانانـــە، (بـــە شـــێوەیێکـــی) فرەهاوخوان(انە) ◌ به طور هترواسیوس

**heteroecism** *noun*
فرەهـاوخوانی، چـەنـدهاوخوانی: پـەرەسـەنـدنی قۆناخە جیاوازەکانی جۆرێکی مشـەخۆر لەسـەر رووەکە هاوخوانە جیاوازەکان، بوونی گوڵە نێر و مێ‌کان لەسەر گژوگیای جیاواز ◌ هترواسیسـم، چندمیزبانی

**heterogamete** *noun*
(زیندەناسـی) جیاگـەمیت، گامێـت‌جیـاواز، هێتێرۆگامیت ◌ هتروگامت

**heterogametic** /ˌhɛt(ə)rə(ʊ)gəˈmɛtɪk/ *adjective*
جیاگــەمیتی، گامێــت‌جیــاوازی، سـەربـە هێتێرۆگامیت: ئاماژە بـە رەگـەزێ کـە کۆمـەڵێ کرۆمۆزۆمی رەگەزی هەیە کە لەباری شێوەوە morphology جیـاوازی‌یـان هـەیـە، ب.ت. (لـە شـیردەراندا) نێـر و (لـە باڵـندەکـاندا) مـێ ◌ وابسته به هتروگامت

**heterogamy** /ˌhɛtəˈrɒgəmi/ *noun*
جیـاجووتی: 1 دۆخـێ کـە لـەودا گوڵـەکانی رووەکـێ دوو یـان چەنـد جـۆرن (دژی homogamy) 2 جـۆرێ زاوزێـی رەگـەزی کـە (لەودا) یـەک‌گرتنی گامێتـە ناهاوشێوەکـان کـە لەباری ئەندازە، پێکهاتە و کارئەندامناسی‌یەوە جیاوازی‌یان هەیە، دەگرێتەوە ◌ هتروگامی

**heterogamous** *adjective*
جیـاجووت: 1 خـاوەنی کۆمـەڵـە گـوڵ یـان گوڵچەی floret کە لەباری رەگەزی‌یەوە دوو جـۆرن بـێ (دژی homogamous) 2 خـاوەنی کۆمـەڵـە گـامێتێکی ئالیـک‌چـوو کـە بـەهـۆی یەک‌گرتنی دەستە گامێتێکی وا بەرهەم دێنێ (دژی isogamous) ◌ هتروگاموس

**heterogeneity** /-dʒə'ni:əti/ *noun*
جیــــاوازی، ناچونیـــەکی، نایـــەکڕەنگـــی، جۆراوجۆری، نایەکشێوەیی ◌ عـدم تجـانس، ناهمگنی

**heterogeneous** /ˌhetərə'dʒi:niəs/ *adjective*
1 ناچونیـەک، نایەکڕەنگ، نایەکشێوە، تێکلاو 2 جۆراوجـۆر، جۆربـەجۆر، فرەجـۆر، جیـاواز: *the heterogeneous population of the United States* 3 (کیمیا) ناچونیەک: ئاماژە بـە پرۆسـەیێ دەکا کە کۆمەڵە ماکێ لە چەندین دۆخدا دەگرێتـــــــــەوە (وەک solid، liquid و gaseous) ◌ 1 نامتجانس، ناهمگن 2 مختلف 3 هتروژنیوس

**heterogeneously** /ˌhetərə'dʒi:niəsli/ *adverb*
ناچونیەکانە، بە شێوەیەکی ناچونیەک، جیاوازانە ◌ به طور ناهمگن

**heterogeneous mixture** *noun*
(کیمیا) تێکەڵەی ناچونیەک ◌ مخلوط ناهمگن

**heterogeneous reaction** *noun*
(کیمیا) کاردانەوەی ناچونیەک، کاردانەوەجیاواز ◌ واکنش ناهمگن

**heterogenetic** *adjective*
سـەربـە هێتێرۆژێنی یـان هێتێرۆژێنێسیس ◌ هتروژنتیک

**heterogenesis** *noun*, also heterogeny
1 کۆمـــەڵـــە یـــان دەســـتەیێکـــی ناچونیـــەک 2 یـــەکبـــەدوای یـــەکهـــاتنی heterogenous بەرەکـان، ب.ت. alternation of generations بـەدوای یـەکهـاتنی بـەرە رەگـەزی sexual generation و مـــــۆرزادەیـــــیـــــەکـــــان parthenogenetic ◌ هتروژنیز

**heterogenous** *adjective*
(زینـدەناسـی و نـەخۆشـیناسـی) ناچونیـەک، جیابنـەڕەت، بنـەڕەتجیـا، سـەرچـاوە یـان بنـــەرەتـەکـەی لـە دەرەوەی زینـــدەوەر یـان ئۆرگانیزمێ دایە، لە بنەڕەتێکی جگە لە بنـەرە تێ نێـوەوە، بـەرهـەمهـاتوو لـە دەرەوەی لـەش ◌ ناهمگن، هتروژنوس

**heteroglossia** *adjective*
جۆراوجـۆری دەنـگ و شـێوازەکـانی گوتـار discourse یان ڕوانگەیێکی بەرهەمێکی ویژەیی literary work ب.ت. ڕۆمانێ ◌ هتروگلوسیا

**heterogonous** *adjective*, also heterogonic
1 سـەربـەو گوڵـە نێرومێ یـان نێـرەمووکانـەی monoclinous کە لە دوو یـان چـەند جـۆرن 2 سەربە یـا دیاریکراو بـەهـۆی heterogony ◌ هتروگونوس

**heterogony** *noun*
1 = alternation of generations، ب.ت. بـەدوای‌یـەکهـاتن یـان گـۆڕانی dioecious یـا allometry 2 parthenogenetic بـەرەیێکـی ◌ هتروگونی

**heterograft** = xenograft

**heterograph** *noun*
ڕێنووسی نادروست ◌ املای اشتباه

**heterographic** *adjective*, also -erographical
سەربە هێتێرۆگرافی ◌ وابسته به هتروگرافی

**heterography** *noun*
1 ڕێنووسی نادروست، ئەو ڕێنووسەی کە لەگەڵ هی ئێستا جیاوازە 2 بەکارهێنانی هەمان پیت یـان لێکدانی پیتـەکـان بـۆ دەرخـستنی دەنگـە جیاوازەکان، وەک لە ئینگلیسیدا، بەکاهێنـانی s لە sit یان easy ◌ 1 املای اشتباه 2 هتروگرافی

**heterokaryon** *noun*, also heterocaryon, *pl.* heterokarya
جیاناوک: خانەیێ (وەک لە mycelium کـارگ یـان کـەڕوویـێ) کـە دوو یـان چـەنـد نـاوکی جیاوازی لەباری بۆماوەیییەوە تیایە ◌ دگرهسته

**heterokaryosis** *noun*
جیاناوکی: دۆخێ کە لەودا خانەیێکی فرەناوکە binucleate یـــان دووناوکـــە multinucleate لەباری بۆماوەیییەوە کۆمەڵە ناوکێکی جیـاوازی تیایـە، دۆخـێ کـە لـەودا ناوکـەکـانی نێـو ســـایتۆپلازمێک لـــەبـــاری ژێنێتیکـــی یـــان بۆماوەیییەوە جیاوازییان هەیە ◌ دگرهستگی

**heterokaryotic** *adjective*
سـەربە جیاناوکی ◌ وابسته به دگرهستگی

**heterolecithal** *adjective*
زەردێنەنابەرامبەر، جیازەردێنە: زەردێنەکە بە ئەندازەیێ بڵاو نەبوونەتەوە (ب.ت. لە هێندێ هێلکە یان هێلکۆکە ovum دا) ◌ ناجوررزرده

**heterologous** /ˌhetə'rɒləgəs/ *adjective*
لێکنـەچوو، ناپێوەندیـدار، بنـەرەتجیـاواز: *-ogous transplants* ◊ *heterologous DNAs* (heterologously *adv*) ◌ بی‌تشابه

**heterology** /ˌhetə'rɒlədʒi/ *noun*
(زۆرتـر پزشـکی و زیندەناسـی) لێکنـەچوویی، ناپێوەندیداری، بنەڕەتجیاوازی ◌ بی‌تشابهی

**heterolysis** *noun*
جیاشـیبوونـەوە، شـیبوونـەوەی دەرەکـی، هێتێرۆلایسیس: شیبوونەوەی ئاوێتەیێ بۆ نێو دوو ئایۆن یان پارچۆڵکەی بارگەدارەوە ◌ دگرکافتی

**heterolytic** *adjective*
سەربە جیاشیبوونەوە یان هێتێرۆلایسیس ◌ وابسته به دگرکافت

**heteromerous** /ˌhetə'rɒm(ə)rəs/ *adjective*
(زیندەناسی) جیاوازبەش(ەکان)، جیابەشەکان، خاوەنی کۆمەڵە بەشێ کە لە چۆنیەتی، ژمارەی توخمەکان یان لێکچوونەوە جیاوازییان هەبێ ◌ دارای اجزای مختلف

**heteromorphic** /ˌhet(ə)rə(ʊ)'mɔ:fɪk/

*adjective*
شێوەجیاواز، جیاشێوە، جیابیچم ۞ دگرریخت، دارای شکل مختلف
**heteromorphism** /ˌhet(ə)rə(ʊ)ˈmɔːfɪzəm/ *noun*
شێوەجیاوازی، جیاشێوەیی، جیابیچمی ۞ دگرریختی
**heteronomous** /ˌhɛtəˈrɒnəməs/ *adjective*
1 گوێڕایەڵ، ملکەچ، ژێردەست 2 (زیندەناسی) ملکەچی قانوونە جیاوازەکانی هەڵدان و پەرەسەندن ۞ 1 تابع 2 هترونوموس
**heteronomy** /ˌhetərˈɑːnəmɪ/ *noun*
گوێڕایەڵی، ملکەچی، ژێردەستی ۞ انقیاد، تبعیت
**heteronym** /ˈhetərənɪm/ *noun*
1 یەک دوو یان چەند وشە کە ڕێنووسێکیان هەیە، بەڵام لە واتا و وتن‌دا جیاوازی‌یان هەیە، وەکوو: *tear* (/tɪə(r)/: فرمێسک) و *tear* (/teə(r)/: دڕین) 2 یەک دوو یان چەند وشە کە دەگەڕێنەوە بۆ هەر ئەو شتە، بۆ نموونە: *lift* و *elevator* ۞ هترونیم
**heteronymic** *adjective*
سەربە هێتێرۆنیم ۞ وابسته به هترونیم
**heteropetalous** *adjective*
جیابەرە، بەرەجیاواز، خاوەنی پەرە لێک‌جیاوازەکان ۞ ناجورگل‌برگ
**heterophil** *noun*, also heterophile
جیاخواز: خاوەنی زیاتر لە یەک جۆر ما یان سابستەنس، وەک ئانتی‌بادی‌یێ کە یەک ئانتی‌ژێنی زیاتری هەبێ ۞ هتروفیل
**heterophony** *noun, pl.* heterophonies
گۆڕانێکی سەربەخۆی سەر تاکە مێلۆدی‌یێ یان ئاوازێ لە لایەن دوو یان چەند دەنگەوە ۞ هتروفونی
**heterophyllous** /ˌhetərəˈfɪləs/ *adjective*
جیاگەڵا، گەڵاجیاواز ۞ دارای برگ‌های گوناگون
**heterophylly** *noun*
جیاگەڵایی، گەڵاجیاوازی ۞ هتروفیلی
**heterophyte** *noun*
جیاگیا، ڕووەک‌جیاواز، گیای مشەخۆری گیاکانی تر ۞ هتروفیت
**heteroplastic** *adjective*
سەربە جیاپەیوەستی ۞ وابسته به هتروپلاستی
**heteroplasty** *noun, pl.* heteroplasties
جۆرێ نەشتەرگەری پلاستیکی برینەکان، کە بە بە شانەیێ لە کەس یان جۆرێکی تر دەکرێ، جیاپەیوەستی ۞ هتروپلاستی
**heteroploid** *adjective, noun*
*adj* خاوەنی ژمارەیێ کرۆمۆزۆمی زیاتر یان کەم‌تر لە ژمارەی کرۆمۆزۆمەکانی پێویست بۆ جۆرێکی تایبەتی *n* خانەیێ کە کرۆمۆزۆمی زیادی یان کەم‌تری لە ڕادەی پێویستی هەبێ ۞ هتروپلوئید
**heteroploidy** *noun*
هێتێرۆپلۆئیدی ۞ هتروپلوئیدی
**heteropolar** /ˌhɛtərəʊˈpəʊlə/ *adjective*
(فیزیک) جیاجەمسەر، جەمسەرجیاواز ۞ هتروپولار
**Heteroptera** /ˌhɛtəˈrɒpt(ə)rə/ *noun, pl.*
جیابالان، جیاپەلان، باڵ‌جیاوازان ۞ هتروپترا
**heteropteran** *noun, adjective*
(مێرووی) جیاباڵ یان باڵ‌جیاواز، جیاپەڵ ۞ هتروپتران
**heterosexual** /ˌhetərəˈsekʃuəl/ *adjective, noun*
*adj* جیارەگەزخواز *n* مرۆی جیارەگەزخواز ۞ (heterosexually /ˌhetərəˈsekʃuəli/ *adv*) *adj* ناهم‌جنس‌گرا *n* آدم ناهم‌جنس‌گرا
**heterosexuality** /ˌhetərəˌsekʃuˈæləti/ *noun*
جیارەگەزخوازی ۞ ناهم‌جنس‌گرایی
**heterosis** /ˌhɛtəˈrəʊsɪs/ = technical term for hybrid vigour
**heterotic** *adjective*
سەربە یا پێوەندی بە hybrid vigour وە هەیە ۞ وابسته به قدرت دورگه‌ای
**heterosporous** *adjective*
هێتێرۆسپۆرۆس، خاوەنی دوو جۆر سپۆر ۞ هترواسپوروس
**heterospory** *noun*
هێتێرۆسپۆری: بەرهەم‌هێنانی microspore و megaspore (وەک لە توو یان دانی گیاکان‌دا) ۞ هترواسپوری
**heterostylous** *adjective*
(ڕووەک‌ناسی) جیاستوونژە ۞ هترواستیلوس
**heterostyly** /ˈhɛtərə(ʊ)ˌstʌɪli/ *noun*
(ڕووەک‌ناسی) جیاستوونژەیی ۞ هترواستیلی
**heterotaxis** /ˈhetərətæksɪs/ *noun*, also heterotaxy or heterotaxia
ناڕێک‌وپێکی، شێواوی ۞ بی‌ترتیبی
**heterothallic** *adjective*
1 جیابنە(سەوزە): خاوەنی دوو یان چەندین قۆناغ یان جۆری هاپلۆئیدی هاوشێوە لەباری بیچم‌ناسی‌یەوە *heterothallic* :morphology dioecious = 2 *heterothallic spores fungi* ۞ (heterothallism (or heterothally) *n*) هتروتالیک
**heterotroph** /ˈhɛt(ə)rə(ʊ)trəʊf, -ˈtrɒf/ *noun*
(زیندەناسی) جیاخۆر، بێگانەخۆر: زیندەوەرێ organism کە پێویستی بە ئاوێتە ئەندامی‌یەکان هەیە بۆ سەرچاوەی بنەڕەتی خۆراکی (بڕوانە autotroph) ۞ هتروتروف

**heterotrophic** *adjective*
سەربە جیاخۆری، سەربە هێتیرۆترۆف، پێوەندی بە جیاخۆری‌یەوە هەیە (heterotrophally *adv*) ◌ وابسته به هتروتروف

**heterotrophy** *noun*
(زیندەناسی) جیاخۆری، بێگانەخۆری ◌ هتروتروفی

**heterotypic** *adjective*, also heterotypical
(زیندەناسی) جیاجۆر، جیاواز لە جۆر، ڕێکخستن یا شێوەدا، خاوەنی دابەش‌بوونی کەم‌بوونەوەیی meiosis بە دوای دابەش‌بوونێکی سروشتی و ئاسایی ◌ هتروتایپیک

**heterozygosis** = heterozygosity

**heterozygosity** *noun*
نارەسەنی، جیاتوخمی ◌ هتروزیگوسیتی، ناجورتوخمی

**heterozygote** /ˌhɛt(ə)rə(ʊ)ˈzʌɪgəʊt/ *noun*
(بۆماوەناسی) نارەسەن، جیاتوخم: کەسێکی heterozygous، کەسێ کە خاوەنی دوو ئالێلی جیاوازی ژین یان کۆمەڵە ژێنێکە (کە یەکێ لەوان سروشتی‌یە، بڕوانە homozygote) ◌ هتروزیگوت، ناجورتخم

**heterozygous** *adjective*, also heterozygotic
نارەسەن، جیانیر، جیاتوخم: 1 خاوەنی جووتێ جیاواز یان ناهاوشێوەی ژێنەکان بۆ هەر تایبەتمەندی‌یێکی بۆماوەیی 2 سەربە یان پێوەندی بە هێتیرۆزیگۆتەوە هەیە ◌ هتروزیگوت

**heth** *noun*
هێت، کێت: هەشتەمین پیتی ئەلفوبێتی عیبری ("h" ی خاڵ‌لەبن) ◌ هت، کت

**hetman** /ˈhɛtmən/ *noun*, *pl.* hetmen
فەرماندەری میلیتاری پۆلەندی یان قەززاقی Cossack ◌ هتمن

**het up** *adjective*
لەدین‌دەرچوو، ڕق‌هەستاو، تووڕە، سوورەوەبوو، تێکچوو، نارەحەت: *What are you getting so het up about?* ◌ عصبانی، برافروخته

**heuchera** /ˈhɔɪkərə, US ˈhjuːk-/ *noun*
گیایێکی ئەمریکای باکووری، گەڵاکانی سەوزی توند و بە شێوەی خڕ یان دڵن، لاسکی باریک و گوڵی وردی هەیە [توخم *Heuchera*: زۆر جۆرن] (بنەڕەت: لە ناوی ڕووەک‌ناسی ئەڵمانی سەدەی هەژدە *Johann H. von Heucher*) ◌ نوعی گیاه

**heuristic** /hjuˈrɪstɪk/ *adjective*, *noun*
*adj* دۆزینەوەیی، خۆدەرخەر، تاقی‌کردنەوەیی: *a -istic assumption* ◊ *heuristic techniques* *n* ڕێچکە یان ڕەوتی دۆزینەوەیی ◌ *adj* اکتشافی، آزمایشی *n* روش یا فرایند اکتشافی

**heuristically** /hjuˈrɪstɪkli/ *adverb*
بە شێوەیەکی دۆزینەوەیی ◌ به طور اکتشافی

**heuristics** /hjuˈrɪstɪks/ *noun*, *pl.*
شێوەی دۆزینەوە: شێوازی لێکدانەوە یان چارەسەرکردنی کێشەکان بە ڕێگای تاقی‌کردنەوە و ئەزموون، تا ڕێگاچارە بدۆزنەوە ◌ روش یافتاری

**HEW** *abbreviation* Department of Health, Education and Walfare
(ئەمریکا) شالیارگە یان وەزارەتی تەندروستی، پەروەردە و ئاسوودەیی ◌ وزارت بهداشت، آموزش و رفاه

**hewer** /hjuːə(r)/ *noun*
1 بڕێنەر، لەت‌کەر، بڕندە، داپاچەر، داربڕ، دارکەر 2 شکێنەر، وردکەر 3 داتاشەر، تاشێنەر، تاشەر 4 کرێکاری کانە خەڵووز (ب.ت. ئەوەی لە ڕەگەوە دایدەتاشێ یان دەیبڕێ)، فرێز: *hewers of wood and drawers of water* زەحمەت‌کێشان، ڕەنج‌بەران، ڕەنج‌کێشان، ئاماژەی کتێبی پیرۆز بە Josh. 9:21. ◌ 1 برنده، هیزم‌شکن 2 شکننده 3 تراشنده

**hewn**[1] /hjuːn/ *adjective*
1 بڕاو، لەت‌کراو، قەڵت‌کراو، داپاچراو، شکێنراو، وردکراو 2 داتاشراو، تاشراو ◌ 1 بریده، شکسته 2 تراشیده

**hewn**[2] /hjuːn/ = past participle of hew

**hex(a)-** /ˈhɛksə/ *prefix*
پێشگر: 1 شەش— 2 شەش *hexaploid*: گەردیلە، کۆمەڵ یان هاوهێزی تیابێ: *hexane* (لە *hex* یۆنانی‌یەوە) ◌ پیشوند: 1 شش- 2 هگزا

**hex** /heks/ *noun*
1 جادووگەر 2 تەلەسم یان دیوبەندی جادوویی ◌ 1 ساحر 2 ورد جادویی

**hexachloroethane** *noun*, also hexachlorethane
ئاوێتەیێکی ژاراوی کریستالی بێ‌ڕەنگ $C_2C_{16}$ کە ب.ت. لە بۆمبە دووکەڵی‌یەکان و بۆ مەهار و بەرگیری کرمی پەپوولەی جگەر liver fluke لە کاوێژکەرانداruminant بەکاردێتری ◌ هگزاکلورواتان

**hexachlorophene** *noun*
هێکزاکلۆرۆفێن: گەردەیێکی کریستالی سپی $C_{13}H_6C_{16}O_2$ کە وەک بەکتریاکوژێ بەکاردێتری ◌ هگزاکلوروفن

**hexachord** /ˈhɛksəkɔːd/ *noun*
هێکساکۆرد، هێگزاکۆرد: پەیژەیێکی موسیقایی شەش‌نۆتە لەگەڵ سێمی‌تۆنێ نێوان نۆتەکانی سێیەم و چوارەمدا ◌ هگزاکورد

**hexad** *noun*
شەش‌کویی، کۆمەڵە یان زنجیرەی شەش‌شتە ◌ مجموعه‌ای از شش چیز

**hexadic** *adjective*
شەش‌کویی، شەش‌شتە ◌ ششگانه

**hexadecimal** /ˌheksəˈdesɪml/ *adjective*, also hex /heks/
شــازدەیی (لەســەر بنچینــەی ژمــارەی 16 و زۆرتریش لە بواری کامپیوتێردا بەکاردێتری): *The number 107 is represented in hexadecimal as 6B* ۞ هگزادسیمال

**hexaëmeron** /heksəˈemərɑ:n/ *noun*, also hexameron
شــەش رۆژی دروس‌کــردن (یــان خولــقاندن Creation، بەپێی کتێبی پیرۆز، Gen. 1) ۞ شش روز خلقت

**hexaëmeric** *adjective*
سەربە شەش رۆژی دروس‌کردن ۞ وابسته به شش روز خلقت

**hexagon** /ˈheksəgən, US -gɑ:n/ *noun*
شــەش‌لا(یــی)، شــەش‌گۆشــە، شــەش‌خــشتەک (بنەڕەت: بە ڕێگای late Latin لە *hexagōnon* یۆنــــانی، لــــە *hexagōnos* "six-angled") ۞ شش‌ضلعی

**hexagonal** /heksˈægənl/ *adjective*
شەش‌لا(یی)، شــەش‌گۆشــە، شــەش‌خــشتەکی ۞ شش‌ضلعی

**hexagonal system** *noun*
ڕێکخــستە یا سیستمی شەشینە یا شەش‌خــشتەک ۞ نظام شش‌گانه

**hexagram** /ˈheksəgræm/ *noun*
ئەستێرەی شەش‌پەڕ ۞ ستارەی شش‌پر

**hexahedral** *adjective*
شەش‌ڕوو(یی)، شەش‌پاڵوو ۞ شش‌وجهی

**hexahedron** /ˌheksəˈhi:drən, US -ˈhed-/ *noun*, *pl.* hexahedra or hexahedrons
شت یان تەنی شەش‌ڕوو ۞ جسم شش‌وجهی

**hexahydrate** *noun*
شەش‌هایدرات، هێگزاهـ(ا)یدرات ۞ هگزاهیدرات

**hexamerous** /hekˈsæmərəs/ *adjective*
(گیانەوەرناسی و ڕووەک‌ناسی) شــەش‌بەشــە ۞ شش‌جزئی

**hexameter** /hekˈsæmɪtə(r)/ *noun*
هــەڵبەســت یــان هــۆنراوەی شــەش‌فــووتی یــان شەش‌کێشی، شەش‌بنەمایی یان شەش‌تربەیی ۞ شعر شش‌وتدی یا شش‌وزنی، مسدس

**hexametric** *adjective*
شــەش‌کێــشی، شــەش‌بنــەمایی، شــەش‌تربــەیی ۞ شش‌وتدی

**hexamethonium** *noun*
هــەریــەک لــە دوو ئاوێتــە $C_{12}H_{30}Br_2N_2$ و $C_{12}H_{30}C_{12}N_2$، بۆ چارەسەری hypertension بەکاردێتریّ ۞ هگزامتونیوم

**hexamethylenetetramine** *noun*, also hexamine
ئاوێتەیێکی کریستالی $C_6H_{12}N_4$، ب.ت. وەک تــاودەر لــە بــواری ڤۆلکانیزاســیۆن و دەرمــانی diuretic بەکاردێتریّ ۞ هگزامتیلن‌ترامین

**hexane** /ˈhekseɪn/ *noun*
(کیمیا) هێگزان، شەشان، شەشین: هەریەک لە ئالکانە ئاوەکی‌یە زووهەڵمیوە ئیزۆمێریکەکان $C_6H_{14}$ کە لە نەوت‌دا دوزراوەتەوە ۞ هگزان

**hexangular** /ˈhekˈsæŋgjələ(r)/ *adjective*
شەش‌گۆشە(یی) ۞ دارای شش زاویه

**hexaploid** /ˈhɛksəplɔɪd/ *adjective, noun*
*adj* 1 شــەش‌بەشــە 2 هێگزاپلۆئید، هێگزاپلوید: خاوەنی ژمارە کرۆمۆزۆمێ کە شەش بەرامبەری ژمارەی haploid بە *n* خانە یان زیندەوەرێکی هێگزاپلۆئید، خانــەیــێ کــە شــەش کۆمــەڵــەی کرۆمــۆزۆمی هــەبــێ ۞ *adj* 1 شــش‌بخــشی 2 هگزاپلوئید سلول یا ارگانیسم هگزاپلوئید

**hexaploidy** *noun*
هێگزاپلۆئیدی، هێگزاپلۆیدی ۞ هگزاپلوئیدی

**hexapod** /ˈheksəpɑ:d/ *noun*
گیانەوەر یــا مێــرووی شــەش‌پێ ۞ جــانور یــا حشرەی شش‌پا

**Hexapoda** /ˌhɛksəˈpəʊdə/ *noun, pl.*
شەش‌پێ‌یان، شەش‌پایان ۞ شش‌پایان

**hexapodous** /hekˈsæpədəs/ *adjective*
شەش‌پێ، شەش‌پا ۞ شش‌پا

**hexapody** /hekˈsəpɑ:dɪ/ = hexameter

**hexastich** /hekˈsəstɪk/ *noun*
کۆپلەی شەش‌دێڕی ۞ قطعەی شش‌بیتی

**hexastichic** *adjective*
سەربە کۆپلەی شەش‌دێڕی ۞ وابسته به قطعەی شش‌بیتی

**hexastyle** /ˈheksəstʌɪl/ *noun*
شەش‌ستوونی، شەش‌کۆڵەکەیی ۞ شش‌ستونی

**hexasyllabic** /ˌhekˈsəsɪˈlæbɪk/ *adjective*
شەش‌بڕگەیی، شەش‌کەرتەیی ۞ شش‌هجایی

**Hexateuch** /ˈheksətju:k/ *noun*
شەش کتێبی سەرەتای تەورات ۞ شش سفر نخست تورات

**Hexateuchal** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە شەش کتێبی سەرەتای تەوراتەوە Old Testament هەیە ۞ وابسته به شش سفر نخست تورات

**hexavalent** /ˌhɛksəˈveɪl(ə)nt/ *adjective*
(کیمیا) شەش‌هاوهێز(ە) ۞ هگزاوالنت

**hexobarbital** *noun*
barbiturate ی $C_{12}H_{16}N_2O_3$ کــــــــە وەک دەرمانی هێورکردنەوە یان حەوێنەر بەکاردێتریّ ۞ هکسوباربیتال

**hexokinase** *noun*
هــەوێنــەیــێ کــە تــاوی phosphorylation شەکرەکانی هێکسۆز دەدا (وەک لە پێکهاتنی glucose-6-phosphate لە گلۆکۆز و ATP)

⬡ هکسوکیناز

**hexosan** *noun*

هێکسۆسان، هێکزۆسان: polysaccharide ێ هاوشێوەی سێلولۆز cellulose بەڵام پێکهاتەیێکی سادە یان ساکار و توانایی شی‌کردنەوە کە لە دیواری خانەکاندا دەس دەکەوێ ⬡ هکسوسان

**hexose** /ˈheksəʊz, US -s/ *noun*

(کیمیا) هێکسۆز، شەشۆز: دەستەیێ لە شەکرە سادەکان کە گەردەکانی شەش گەردیلەی کاربۆنیان تیایە (ب.ت. گلۆکۆز و فرۆکتۆز) ⬡ هکسوز

**hexoxide** *noun*

هێکسۆکساید، هێکزۆکساید، شەشۆکساید ⬡ هکزوکسید

**hexyl** /ˈhɛksʌɪl, -sɪl/ *noun*

(کیمیا، وەک ئاوەڵناو) هەریەک لە پێنج کۆمەڵی ئیزۆمێریکی تاک‌هاوهێز بە شێوگی $C_6H_{13}$ و لە هێگزان دەگیرێ ⬡ هکسیل

**hexylic** *adjective*

سەربە یا پێوەندی بە هێکسیل یا هێکسایلەوە هەیە ⬡ وابسته به هکسیل

**hexylresorcinol** *noun*

ئاوێتەیێکی فینۆلی کریستاڵی $C_{12}H_{18}O_2$ کە وەک گەندسڕ antiseptic و کرم‌کوژ anthelmintic بەکاردێنرێ ⬡ هکسیل‌رسیرسینول

**hey** /heɪ/ *interjection*

هەی! هۆی! ئەهۆی! هۆ! (نافەرمی) سڵاو، چۆنی ⬡ آهای! سلام

**heyday** /ˈheɪdeɪ/ *noun*

هەرەت، تاف، جەنگە، لووتکە، پۆپە، ترۆپک، prime: *a fine example from the heyday of Italian cinema* ⬡ بحبوحه، اوج

**hey presto** *interjection*

هەنوونی مەنوونی (خەزێنەی پاشام بە قوونی) ⬡ اجی مجی لاترجی

**Hezekiah** *noun, Hebrew Ḥizqīyāh*

حێزکیا، حێزقیا: پادشایێکی یەهوودا (یان یەهوودیە) Judah لە سەدەکانی 7 و 8 ی بەرلە زایین. II Kings 18 ⬡ حزقیا

**Hf** symb. the chemical element hafnium

**HF** *abbreviation* high frequency

**HGC** /ˌeɪtʃ ef ˈsiː/ *abbreviation* hydrofluorocarbon

ئێچ‌ئێف‌سی: جۆرێ گاز کە ب.ت. لە aerosol ەکاندا بەکاردێنرێ و زیان ناگەیێنن بە تویی ئۆزۆن لە کەش و ئەتمۆسفێری زەوی ⬡ اچ‌اف‌سی

**Hg** *noun,* symb. the chemical element mercury, Latin hydrargyrum

**HG** *abbreviation* 1 His Grace 2 Hes Grace

1 جەنابی بەرێز 2 جەنابی بەرێز (بۆ ژن) ⬡ 1 عالی‌جناب 2 سرکار علیه

**HGV** *abbreviation* heavy goods vehicle

ماشێنی قورس، ماشێنی گەورە ⬡ خودرو سنگین

**HGV licence** *noun*

دەستوورنامەی (لێخوڕینی) ماشێنی گەورە ⬡ گواهی‌نامەی پایەیک

**HH** *abbreviation* 1 His Highness 2 Hes Highness 3 His Holiness

1 جەنابی بەرێز 2 جەنابی بەرێز (بۆ ژن) 3 جەنابی بەرێز ⬡ 1 والاحضرت، عالی‌جناب 2 والاحضرت 3 عالی‌جناب

**H-hour** *noun*

(لە شەڕی جیهانی یەکەمدا) کاتی دەس‌پێ‌کردنی شەڕ یان کردارێکی شەڕی (*H* کورتەی *hour* + hour) ⬡ اچ‌هور

**hi** /haɪ/ *interjection*

هەی، سڵاو، چۆنی، باشی ⬡ هی! سلام

**hiatus** /haɪˈeɪtəs/ *noun, pl.* hiatuses

1 هەڵوەستە 2 (بەش یا ئەندامێکی لەش) کەلێن، کەلەبەر، کون، بۆشایی، مەودا 3 دابڕان، پسان 4 (زمانەوانی) پێک‌گەیشتنی بزوێنەکان ⬡ 1 وقفه 2 شکاف 3 گسستگی 4 (زبان‌شناسی) التقای مصوت‌ها

**hiatus hernia** *noun,* also hiatal hernia

کونی قوڕی، کەلەبەر یا کەلێنی فیتق یا قوڕی، کەلەبەری هێرنیا: کونێ لە diaphragm کە سووریچک oesophagus لێی تێدەپەڕێ و دەگاتە مێعدە ⬡ شکاف فتق

**Hib** *noun,* acronym from Haemophilus influenzae type B

جۆرێ بەکتریا کە دەبێتەهۆی ئاوسانی پەردەی مێشک meningitis ی منال ⬡ هیب

**hibachi** /hɪˈbatʃi, US ˈhɪbətʃi/ *noun, pl.* hibachis

هیباچی، مەنقەڵی ژاپۆنی ⬡ هیباچی

**hibernaculum** /haɪbəˈnækjʊləm/ *noun*

بەرگەزستان، بەرگی زستانی، جێ‌پەنای زستان، زستانەجێ ⬡ غلاف زمستانی، پناهگاه زمستانی

**hibernation** /ˌhaɪbəˈneɪʃn, US -bərˈn-/ *noun*

زستانەخەو، سڕبوون، مات‌بوون، مت‌بوون: *to go into/come out of -ernation* ⬡ زمستان‌خوابی

**hibernal** /haɪˈbɜːnl/ *adjective*

زستانی، زڤستانی، سەربە جستان ⬡ زمستانی

**Hibernian** /hʌɪˈbəːnɪən/ *adjective, noun*

ئیرلەندی ⬡ ایرلندی

**Hibernianism** *noun,* also Hibernicism

زاراوە یا بێژەیەکی ئیرلەندی ⬡ اصطلاح ایرلندی

**Hiberno-** /hʌɪˈbəːnəʊs/ *prefix*

پێشگر: ئیرلەندی، ئیرلەندی و...: *Hiberno-English* (بنەڕەت: لە *Hibernus* لاتینی

سەدەکانی نێوەڕاست "ئیرلەندی Irish"، بڕوانە Hibernian) ◌ پێشوند: ایرلندی، ایرلندی و...

**hibiscus** /hɪˈbɪskəs, US haɪ-/ *noun*

1 بامیە، خێزانی mallow [تۆخم *Hibiscus*: زۆر جۆرن] 2 (گوڵە)هێرۆ (بنەڕەت: لاتین، لە *hibiskos* یۆنانی "marsh mallow") ◌ 1 بامیە 2 خطمی

**hiccup** /ˈhɪkʌp/ *noun*, also hiccough /ˈhɪkʌp/

1 نزگرە، هەرس، هەسر، شهی، هکەهک، ئیسک 2 کێشەی نیوەچڵ، هەڵوەستەی کاتی یان کورت، ئاستەنگی چکۆلانە، کێشەی بچووک، مەسەلەیەکی هیچ، گرفتێکی چکۆلانە: *There was a slight hiccup in the timetable* ◌ 1 سکسکە 2 وقفەی موقت، مسألەی جزئی، نقص جزئی

**hic jacet** /hɪk ˈdʒeɪsɛt, US ˈjakɛt/ *noun*

(ویژەیی) بەردەنووسی گۆڕ، کێلی نووسراو (بنەڕەت: واتای وشەکە "لێرەدا ڕاکشاوە یان خەوتووە") ◌ کتیبەی روی گور

**hick** /hɪk/ *noun, adjective*

*n* بنیادەمی لادێیی و پشتکێوی *adj* دێهاتی، کێوی، دەشتەکی، دواکەوتوو: *a hick town* ◌ *n* آدم دهاتی *adj* دهاتی

**hickey** /ˈhɪki/ *noun, pl.* hickeys

1 زیپکە، لکە، پەڵە، گەرد 2 بۆری چەمێن، لوولەنووشتێن، دەزگای نووشتاندنەوە یان چەماندنەوەی لوولە 3 (نافەرمی) گاز (لە ڕووی خۆشەویستییەوە) ◌ 1 جوش، لک 2 لولەخم‌کن 3 گاز

**hickory** /ˈhɪkəri/ *noun*

1 (هەروەها hickory tree) دارگوێزی ئەمریکایی [تۆخم *Carya*: چەندین جۆرن] 2 داری سەختی هیکێری ◌ 1 گردوی امریکایی 2 چوب این درخت

**hickwall** /ˈhɪkwɔːl/ *noun*

(باڵندەناسی) دارکونکەرەسەوزە ◌ دارکوب سبز

**hid** /hɪd/ = past of hide

**hidalgo** /hɪˈdalgəʊ/ *noun, pl.* hidalgos

(لە ولاتانی سپانیایی‌زمان) بەڕێز (بنەڕەت: لە *hijo de algo* سپانیایی "کوڕی شتێ son of something") ◌ آقا

**Hidatsa** /hɪˈdatsə/ *noun, pl.* same or Hidatsa

1 ئەندامی گەلی سوورپێست کە لە ڕووباری میسۆری سەروو دەژین 2 زمانی سوئی Siouan ئەو گەلە ◌ هیداتسا

**hidden** /ˈhɪdn/ = past participle of hide

**hidden agenda** *noun*

هۆکاری نهێنی (یان نەهێنی) یان شاراوە ◌ عامل پنهانی

**hidden reserves** *noun, pl.*

(کۆمپانییێ) پارەی نەهێنی یان شاراوە ◌ وجوه پنهانی

**hide**[1] /haɪd/ *noun*

سێپە، حەشارگە، ڕەبەت، بۆسە، کۆلیت ◌ کمین‌گاه

**hide**[2] /haɪd/ *noun*

پێستە، کەوڵ، چەرم (خۆش کراپێ) ◌ پوست

**hide**[3] /haɪd/ *noun*

پێوەرێکی زووی زەوی لە ئینگلتەرە، نێوان 60 تا 120 ئاکر (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ هاید

**hide-and-seek** /ˌhaɪd n ˈsiːk/ *noun*

چاوشارۆکێنە، قەری‌قەری، زۆپ‌زۆپ، قولولو، جۆجوێێن ◌ قایم‌موشک

**hideaway** /ˈhaɪdəweɪ/ *noun*

1 حەشارگە، مالیتە، پەناوپەسیو، پەناگە، سێپە، بۆسە، hideout: *He escaped to his hideaway in the country at weekends* 2 شوێنی خەڵوەت، جێی چۆڵ، پەنا، ستار، retreat ◌ 1 مخفی‌گاه 2 خلوتگاه

**hidebound** /ˈhaɪdbaʊnd/ *adjective*

چەق‌بەستوو، باوەڕکۆن، دەمارگرژ، وشکەبیر، بیرتەسک، بیرتەسکانە، کۆنەپەرست، کۆنەپارێز ◌ متحجر، کوته‌فکرانه، واپس‌گرا، محافظه‌کار

**hideous** /ˈhɪdiəs/ *adjective*

ناحەز، ناشیرین، بەزەرە، دزێو، کرێت، قەبە، بێ‌شەرمانە، ناخۆش، تاڵ، ترسناک، بەژان (*adv* hideously: ناحەزانە، ترسناکانە؛ *n* hideousness: ناحەزی، ناشیرین، دزێوی، بێ‌شەرمی؛ بنەڕەت: لە *hideus* ,*hidos* فەرەنسی کۆن، لە *hide* ,*hisde* "ترس") ◌ شنیع، کریه، زشت، ناخوشایند، ترسناک

**hideout** /ˈhaɪdaʊt/ = hidwaway

**hidey-hole** *noun*, also hidy-hole = hiding-place

**hiding**[1] /ˈhaɪdɪŋ/ *noun*

شاردنەوە، قەشارتن، لەبەرچاولابردن، پەنادان، بزرکردن، حەشاردان: *We spent months in hiding* ◌ اختفا، نهان‌سازی

**hiding**[2] /ˈhaɪdɪŋ/ *noun*

1 دارکاری، کوتەک، بیراز، لێدان، شێلاق‌کاری: 2 *to give sb/get a (good) hiding* تێ‌شکانی سەخت: *The team got a hiding in their last game* ◌ 1 کتک 2 شکست جانانه

**hiding-place** /ˈhaɪdɪŋ pleɪs/ *noun*

حەشارگە، حەشار، پەناوپەسیو، پەنا، پەسیو، بۆسە ◌ مخفی‌گاه

**hidrosis** /hɪˈdrəʊsɪs/ *noun*

ئارەق‌دەرادان ◌ عرق زیاد

**hiemal** /ˈhaɪɪməl/ *adjective*

زستانی، جستانی، زڤستانی ◌ زمستانی

**hier(o)-** *prefix*

پێشگر: پیرۆز (بنەڕەت: لە *hieros* یۆنانییەوە

"sacred") ◌ پێشوند: مقدس

**hierarch** /ˈhaɪərɑːk/ *noun*

پێشەوایی ئایینی یان دینی، ڕێبەری دینی یان تۆلی ◌ زعیم دینی

**hierarchical** /ˌhaɪəˈrɑːkɪkl, US -ˈrɑːrk-/ *adjective*

پلەبەرزبوونەوەیی، زنجیرەپلەیی، زنجیرەپایەیی، پلەمەندانە، پایەمەندانە، بەپێی گەورەوبچووکی: *a* ◊ *a hierarchical structure/organization* ◌ *hierarchical society* پایگانی، سلسلەمراتبی

**hierarchically** /ˌhaɪəˈrɑːkɪkli, US -ˈrɑːrk-/ *adverb*

پلەمەندانــە، پایــەمــەندانــە، بــە شــێوەیەکی زنجیرەپلەیی ◌ به طور پایگانی

**hierarchical organization** *noun*

ڕێکخراوەی پایەمەندانە، ڕێکخراوەی پلەمەندانە یان هایێراریکال ◌ سازمان پایگانی

**hierarchical society** *noun*

کۆمەڵی پایەمەندانە، کۆمەڵی پلەمەندانە یان هایێراریکال ◌ جامعەی پایگانی

**hierarchical structure** *noun*

پێکهاتەی پایەمەندانە، پێکهاتەی پلەمەندانە یان هایێراریکال ◌ ساختار پایگانی

**hierarchical sysrem** *noun*

سیستمی پایەمەندانە، ڕێکخستەی پلەمەندانە یان هایێراریکال ◌ نظام پایگانی

**hierarchy** /ˈhaɪərɑːki, US -rɑːrki/ *noun, pl.* hierarchies

1 پلەمەنــدی، پلەبەرزبوونــەوەیی، زنجیرەپایــە، زنجیرەپلــە، پایــەمــەنی، پلــەمــەنی: *the She's quite* ◊ *social/political hierarchy 2 high up in the management hierarchy* کاربەدەســـتان (گرنـــگ‌تـــرین ئەنـــدامانی ڕێکخراوەیــێ) 3 (یــەزدانناســی) دەزگــا یــان سیستمی نەریتی پلەی فریشتەکان و بوونەوەرانی ئاسمانی تر 4 دەزگای کلیسە ◌ 1 سلسلەمراتب 2 مقامات 3 نظام فرشتگان 4 نظام کلیسا

**hieratic** /ˌhʌɪəˈratɪk/ *adjective*

1 قەشــەیی، پێوەنــدی بــە کەشــەکانــەوە هــەیە، sacerdotal 2 ســەربــە هێــڵی وێنــەیی، ســەربــە نیشــانە یا هێمــای نهێنی (نووسینی میســری‌یانی کۆن، کورتکراوەی (یا سادەتر لە) هایرۆگلیف، قەشــەکــان بــەکاریــان دێنــا، بروانــە demotic) 3 سەربە هێڵی وێنەیی میسر یا شێوازەکانی هونەری یۆنانی و میسر 4 یەکجار فەرمی یان شێوازمەند، (hieratically *adv*) *hieratic poses* :stylized ◌ 1 کشیشی 2، 3 و 4 هایراتیک

**hiero-** /ˈhʌɪrəʊ/

پێشوند: پیرۆز (بنەڕەت: لە *hieros* یۆنانی‌یەوە) ◌ پیشوند: مقدس

**hierocracy** /hʌɪˈrɒkrəsi/ *noun, pl.* hierocracies

1 حکومــــەتی پیــــاوانی دیــــنی 2 دەســــتەی دەســەڵاتدارانی پیــاوانی دیــنی ◌ 1 حکومــت روحانیون 2 هیأت حاکمان روحانی

**hieroglyph** /ˈhaɪərəglɪf/ *noun*

نیشانەی وێنەیی، هێمای وێنەیی، هێڵی وێنەیی، وێنەهێڵ، نیشانە یان هێمای نهێنی یان نەهێنی، هایرۆگلیف، هیرۆگلیف ◌ هیروگلیف

**hieroglyphic** /ˌhaɪərəˈglɪfɪk/ *adjective, noun,* also hieroglyphical

*adj* (هێڵ) وێنــەیی، نهێنی، نیشــانەیی، ڕەمــزی، ئاڵــــۆز، نادیــــار، تــــەماوی، نــــەخوێنراوە، لەتێگەیشتن‌نەهاتوو *n* نیشانەی وێنەیی، هێڵی وێنەیی ◌ *adj* تصویری، رمزی، بغرنج، مبهم *n* علامت تصویری، خط تصویری

**hieroglyphically** /ˌhaɪərəˈglɪfɪkli/ *adverb*

ئاڵۆزانە، تەماوی‌یانە، بە شێوەیێکی نارۆشن یان نهێنی، بە شێوەیێکی یان نەهێنی ◌ بـه طـور بغرنج یا مرموز

**hieroglyphics** /ˌhaɪərəˈglɪfɪks/ *noun, pl.*

هێڵی وێنەیی، هێڵەپیرۆزە، کەندەپیرۆزە ◌ خـط تصویری

**hierogram** /ˈhʌɪrə(ʊ)gram/ *noun*

نووسراوە یا هێمای پیرۆز ◌ نوشته یا نماد مقدس

**hierology** /hʌɪˈrɒlədʒi/ *noun*

وێژە یان زانست و ئاگایی پیرۆز ◌ ادبیـات یـا دانش مقدس

**hierophant** /ˈhʌɪrə(ʊ)fant/ *noun*

1 شــیکەرەوەی ڕاز و ســری نهێنی و پیرۆز، پێشەوا(ی دیــنی) 2 = expositor ◌ مفســر روحانی یا اسرار مقدس

**hierophantic** /ˌhʌɪrə(ʊ)ˈfantic/ *adjective*

سەربە hierophant ◌ وابسته به hierophant

**hi-fi** /ˈhaɪ faɪ/ *abbreviation* high fidelity

**higgledy-piggledy** /ˌhɪgldi ˈpɪgldi/ *adjective, adverb*

وەکـــوو چێـــشتی مجێـــوز، تێکەوپێکـــە، تێکـــەڵوپێکـــەڵ، شـــپرزە، نارێـــکوپێـــک: *a* ◌ *higgledy-piggledy collection of houses* قاتی‌پاتی، درهم‌برهم

**high** /haɪ/ *adjective, adverb, noun*

1 *adj, adv* بــڵیند، بــەرز، بلنــد، کــەڵ 2 بــە بڵینداییی، بە بەرزایی 3 گرنگ، سەرەوە، گەورە، پایەبەرز، بەرز، باڵا 4 هەرەباش، باش‌ترین 5 (دەنگ) تیژ، زیقە 6 لەبان، گران، لەسەرێ، باڵا 7 توند، سەخت 8 (وەخت) نیوەڕاست، گەرمە، چلە 9 (گێر) سووک، سەرەوە 10 مەست، کەیل، نەشە 11 (گۆشت) بۆ(ن)گرتوو، بۆگەن، ماوە 12 بـــەهێز، بەقـــەوەت، بـــەتین 13 (دەموچـــاو) سوورەوەبوو 14 لەڕادەبەدەر، بێ‌ئەندازە، زۆر 15 بــەرز 16 (ڕێتــە) زووزوو، تونــد، خێــرا *n* 1

بەرزایی، بڵیندایی، جێگای بەرز، بەرزان، گڤانده 2 (نافـەرمی) وورووژان، هـەژان 3 مەسـتی، سەرخۆشـی، نەشـئەیی 4 بەهەشـت، ئاسمـان 5 (کـەش‌ناسـی) سـووڕدانەوە، ئـەنتی‌سـایکلۆن 6 گێری سووک یان سەرەوە ۞ 1 *adj, adv* بلند 2 به بلندی 3 مهم، عالی‌رتبه، رفیع 4 عالی 5 (صوت) زیر 6 زیاد، بالا 7 شدید 8 (زمان) وسط 9 (دنده) سبک 10 مست 11 بوگرفته 12 نیرومند 13 برافروخته 14 بیش از حد معمول 15 بلند 16 تند *n* 1 بلندی، جای بلند 2 هیجان 3 مستی، نشئگی 4 بهشت، آسمان 5 واچرخه 6 دنده سبک

**high altar** *noun*

مێـراو یـان مێحـرابی سـەرەکی کڵێسـەیێ ۞ محراب اصلی کلیسائی

**high and mighty** *adjective*

بەترووتۆپ، بەفیز، لووت‌بەرز، بەدەمار، بەپۆز، بەهەوا ۞ افاده‌ای

**highball** /ˈhaɪbɔːl/ *noun*

های‌بۆل (= خواردنەوەیەکی ئەلکوولـی‌یە زۆرتر ویسکی و براندی، تێکەڵ بە ئاو یان سۆدا) ۞ های‌بال

**high beam** *noun*

شـەوقی سـەرەوە، تیشکی بان ۞ نور بالا

**highborn** /ˈhaɪbɔːn/ *adjective*

ڕەسـەن‌زادە، گەورەزادە، خانەدان، ڕەگـەزپاک، بەرەچەڵـەک، نـەجیب‌زادە، زادەی بـەرزترین چینی کۆمەڵگا ۞ نسب‌زاده، اشرافی

**highboy** /ˈhaɪbɔɪ/ *noun*

دۆلابی یـا قەفەسـەی بـەرزی پایـەدار (بـۆ حاجەت) ۞ کمد ظروف

**highbrow** /ˈhaɪbraʊ/ *noun, adjective*

خـاوەن فەرهـەنگ و هونـەری بـەرز، ڕۆشـنبیر: *highbrow readers* ◊ *highbrow newspapers* ۞ فرهیخته، دارای فرهنگ و هنر والا

**highbush** *noun*

بە شـێوەی دەوەنی درێژ و ڕاسـت erect ۞ بـه شکل بوته‌های بلند و شق

**highbush blueberry** *noun*

1 دەوەنێکی شین‌دۆستی ئەمریکای باکووری، بە بـەری ڕەشـی شـین‌بـاوەوە [*Vaccinium corymbosum*] 2 بەرەکەی ۞ 1 نـوعی بوتـه 2 میوه‌ی آن

**highbush craneberry** *noun*, also cranberry bush

دەوەنێکی viburnum، بە هێشووە گوڵـی سپی یان و بەری ئاڵی خواردەنی‌یەوە [*Viburnum opulus*] ۞ نوعی بوته

**high chair** *noun*

ئەسـکەمل یـا کورسـی (بـەرزی) منـاڵ (بـۆ نان‌خواردن) ۞ صندلی بچه

**High Church** *noun*

باسـک یـا لقی کونەپارێزی کڵێسـەی ئینگلتـەرە (پێداگرتن لەسەر نەریت و سرووت و دەسـەڵاتی قەشە و گەورەقەشـەکان) ۞ شاخه‌ی محافظه‌کـار کلیسای انگلستان

**High Churchman** *noun, pl.* High Churchmen

ئەندامی باسـک یـا لقـی کونـەپارێزی کڵێسـەی ئینگلتەرە ۞ عضو های چرچ

**high-class** *adjective*

1 هـەرەباش، بـاش‌تـرین، نمرەیـەک، یـەکجار چـاک: *a high-class restaurant* 2 لە چینی سەرەوە، پایەبەرز: *to come from a -gh-class background* ۞ 1 درجه‌یک 2 از طبقه‌ی بالا

**high-coloured** *adjective*

(دەم‌وچاو) سوورەوەبوو، سوور ۞ برافروخته

**high command** *noun*

گەورەبەرپرسان ۞ مسؤلان ارشد

**High Commision** *noun*

(وڵاتانی هاوبەرژەوەند) باڵوێزخانە. باڵیوزخانە ۞ سفارت

**High Commisioner** *noun*

باڵیوز، باڵوێز، نوێنەری پایەبەرز ۞ سفیر

**High Court** *noun*, also High Court of Justice

دادگای باڵا، دادگای بەرز ۞ دیوان عالی

**high culture** *noun*

فەرهەنگ یان چاندی بەرز ۞ فرهنگ والا

**high day** *noun*

(بریتانیا) ڕۆژی بـەرز، ڕۆژی جـەژن (دینی) ۞ های دی

**high-density lipoprotein** *noun, abbreviation* HDL, also good cholesterol

کۆلیسـترۆلی بـاش: لیـپۆپرۆتێینێکی پلازمـای خوێن کە لە ڕێژەیێکی زۆری پرۆتێین لەگەڵ triglyceride و کۆلیسـترۆل پێکهـاتووە (پێوانـە LDL) ۞ های دنسیتی پروتئین، کلسترول مفید

**higher animals** *noun, pl.*

(تکنیکی) بەرزەگیانەوەر (= ئەو گیانەوەرانەی کـە پێشتوونەتـە قۆنـاخێکی پێشـکەوتـووی پەرەسەندن) ۞ هایر انیملس

**higher concept** *noun*

چەمکی سەرتر، چەمکی بەرزتر ۞ مفهوم برتر

**higher criticism** *noun*

ڕەخنـەی بـەرز (= لێکۆڵـینەوەی ئەسـفاری تەورات یان لێکۆڵینەوە لە نووسراوەکانی کتێبی پیرۆز بۆ دیاریکردنی مێژووی وێژەیی‌یان literary history و واتـا و مـەبەسـتی نووسەرانیان؛ *higher critic n*) ۞ نقد اعلی

**higher education** *noun, abbreviation* HE

خوێندنی بەرز، خوێندنی باڵا، خوێندنی زانکۆیی ۞ تحصیلات عالی، آموزش عالی

**higher fungus** *noun*
کارگ یان کەڕووە بالاکان، کارگە بەرزەکان ۞ قارچ‌های عالی

**higher mathematics** *noun, pl.*
بیرکاری‌یە بالاکان، ماتماتیکی بالا (چەند جۆریکی بیرکاری پێشکەوتوو کە لە زانکۆ دەخوێنرێ) ۞ ریاضیات عالی

**higher plants** *noun, pl.*
بەرزەڕووەک، بەرزەگیا (= ئەو ڕووەکانەی گەیشتوونەتە قۆناخێکی پێشکەوتووی پەرەسەندن) ۞ هایر پلانتس

**higher-up** *noun*
(نافەرمی) مرۆی پایەبەرز ۞ آدم ردەبالا

**high explosive** *noun*
تەقەمەنی بەهێز (وەک TNT) ۞ مادەی منفجرەی قوی

**highfalutin** /ˌhaɪfəˈluːtɪn/ *adjective*, also highfaluting /-tɪŋ/
گران، بەشکۆ، بەدەبدەبە، تەقوڕەق، خۆپیشاندەرانە: ۞ *highfalutin language* پرطمطراق، متظاهرانە، مغلق

**high fidelity** *noun, adjective*
*n* (دەزگاکانی دەنگی) کوالیتەی باش *adj* زۆرباش، های‌فای، بە کوالیتەیێکی باش (ەوە): ۞ *a hi-fi system* *n* کیفیت خوب *adj* بسیار حساس، با کیفیت خوب

**high finance** *noun*
دارایی بەرز یان زەبەند ۞ دارایی کلان

**high-flier** /ˈhaɪ flaɪə(r)/ *noun*, also high-flyer
مرۆی بەرزەفڕ: *academic high-flyers* ۞ آدم بلندپرواز

**high-flown** *adjective*
(زمان و هتد) گران، بەشکۆ، تەقوڕەق: *His high-flown style just sounds absurd today* ۞ مغلق، پرطمطراق

**high-flying** *adjective*
بالافڕ، بەرزفڕ، بەرزەفڕ ۞ بلندپرواز، جاەطلب

**high frequency** *noun*
بەرزەلەرە، لەرەی بالا یان بەرز (لە 3وە تا 30 مێگاهێرتز) ۞ بسامد بالا

**high gear** *noun*
گێری سەرەوە، گێری سووک ۞ دندەی سبک

**High German** *noun*
زمانی ئالمانی پێوانە یان ستاندارد (ئاخافتن و نووسراوە، لە بەرزایی‌یەکانی باشووری ئەلمانیا قسەی پێدەکرێ) ۞ آلمانی معیار

**high-grade** /ˈhaɪ greɪd/ *adjective*
هەرەباش، یەکجارچاک، هەرەبالا، نمرەیەک، چاکی چاک، عال ۞ عالی

**high-handed** /ˌhaɪ ˈhændɪd/ *adjective*
1 سەرەڕۆ، زۆردار، خۆپیشەملە، کەلەگا 2 دەسەلاتدارانە، لە ڕووی زۆرەوە، دەستووردەرانە، زۆردارانە، کەلەگایانە، ۞ *a high-handed manner* :overbearing 1 زورگو، مستبد 2 تحکم‌آمیز

**high-handedly** *adverb*
زۆردارانە، زۆردارەکی، بە شێوەیەکی زۆردارانە، بە زۆرداری ۞ (به طور) آمرانه، مستبدانه

**high-handedness** *noun*
کەلەگایی، سەرەڕۆیی، ملهوڕی، زۆرداری ۞ زورگویی، استبداد

**high hat** *noun, adjective*
*n* کلاوی سەرێ *adj* بەپۆز، بەدەمار، فیزن، لەخۆبایی، خۆبەزل ۞ *n* کلاه بالا *adj* افادەای

**high-heeled** *adjective*
بە کەوشی پاژنەبەرزە(وە)، کەوش نالچەبەرز (پاشنەبەرز): ۞ *high-heeled shoes/boots* دارای کفش پاشنەبلند

**high heels** *noun, pl.*
پێلاو یان کەوشی پاشنەبەرز، کەوشی نالچەبەرز ۞ کفش پاشنەبلند

**High Holidays** *noun*, also High Holy Days
دوو جەژنی جوولەکان (Yom Kippur و Rosh Hashana) ۞ های هالیدیس

**highjack** = hijack

**high jinks** *noun*
خۆشی، شادی، بەزموڕەزم، هەراوهوریا ۞ شادی، بزن و بکوب

**high jump** *noun*
بەرزەباز، بازی بەرز، کەلەمباز: *She won a silver medal in the -gh jump* ۞ پرش ارتفاع

**highland** /ˈhaɪlənd/ *adjective, noun*
*adj* 1 شاخوداخ، کێوان، سەرچیا 2 (Highland) سەربە چیانشینانی سکاتلەند *n* 1 ناوچەی سەرچیا، ناوچەی شاخاوی، کوێستان، کەژوکێو، هەردەبانان 2 (بە the Highland) بەشی شاخاوی باکووری سکاتلەند ۞ *adj* 1 کوهستانی 2 (به H) وابسته به ساکنان کوهستان اسکاتلند *n* 1 منطقەی کوهستانی 2 قسمت کوهستانی شمال اسکاتلند

**Highland dress** *noun*
بەرگی هایلەندی ۞ لباس هایلند

**highlander** /ˈhaɪləndə(r)/ *noun*
1 چیانشین، سەرچیانشین، دانیشتووی سەرچیا 2 (Highlander) (سکاتلەند) چیانشین، سەرچیانشین، کێونشین، شاخ‌نشین ۞ 1 ساکن کوهستان 2 (به H) ساکن کوهستان

**Highland fling** *noun*
سەما و هەلپەڕکێیەکی کرژی بەتەنیای سکاتلەندی کە زنجیرە هەنگاوێکی ئالۆزی تیایە ۞ رقص هایلندی

**Highland Games** *noun, pl.*
یاری‌یەکانی هایلەندی ◌ بازی‌های هایلندی
**Highlands** *noun, pl.*
1 ناوچـە شـاخاوی‌یـەکانی سـکاتلەند 2 ناوچـە کویـستانی‌یەکان، ناوچـە شـاخاوی‌یەکان (هـی ولاتـێ) ◌ 1 مناطق کوهستانی اسکاتلند 2 مناطق کوهستانی
**high-level** *adjective*
1 پایەبـەرز، پلەبـەرز: *high-level* -h- ◊ *high-level staff* ◊ *talks/negotiations* 2 ئاستبەرز، ئاستی بەرز، پێشکەوتوو: *level corruption* *a high-level walk in the hills* ◊ *a -gh-level course* ◌ 1 عالی‌رتبە 2 سطح بالا
**high-level language** *noun*
زمانی ئاستی بەرز (هاوشێوەی زمانی مرۆڤ لەچاو زمانی کامپیوتێر) ◌ زبان سطح بالا
**high-level meeting** *noun*
دانیشتن یان کۆبوونەوەی (لە) ئاستی بەرز ◌ نشست سطح بالا
**high-level negotiation** *noun*
دان‌وستانی ئاستی بەرز ◌ مذاکرەی سطح بالا
**highlife** /'haılaıf/ *noun*, also high-living
ژیانی دەوڵەمەندانە، ژیانی پڕدیدی‌وبۆدی ◌ زندگی پرتجمل
**highlight** /'haılaıt/ *noun*
1 گرنگ‌ترین، خۆش‌ترین و سەرنج‌ڕاکێش‌ترین بەشی شتێ، سەرگوڵ 2 (highlights) (وێنە یان کێشانەوە) جێگـا ڕۆشـنەکان ◌ 1 مهم‌ترین، جذاب‌ترین قسمت چیزی 2 (در جمع) نواحی روشن
**high-low** *noun*
چەکمەی قەیتانی تا قولەپێ و پاژنەنزم، لە بواری سەربازی‌دا لە سەدەکانی 18 و سەرەتای سەدەی 19 لەبەر دەکرا ◌ های لو
**highly** /'haıli/ *adverb*
زۆر، یەکجار: ◊ *highly skilled/intelligent* ◊ *highly successful* ◌ خیلی
**highly-strung** *adjective*
دڵ‌ناسک، زووتووڕە، زووتۆر، زووڕەنجاو، تۆرپنۆک ◌ زودرنج
**High Mass** *noun*
ڕێ‌وڕەسمی فەرمی شێوی خواوەندی (کلیسای کاتۆلیکی ڕۆم) ◌ آیین عشاء ربانی
**high-minded** /ˌhaı 'maındıd/ *adjective*
ڕەوشتبەرز، گەورە، ئاکاربەرز، بەرز ◌ با مناعت، بزرگ‌منش، والا
**high-mindedly** *adverb*
ڕەوشتبەرزانە، بەرزانە ◌ با مناعت
**high-mindedness** *noun*
ڕەوشتبەرزی، ئاکاربەرزی، گەورەیی ◌ مناعت، بزرگ‌منشی
**high muck-a-muck** *noun*
(ئەمریکا و نافەرمی، کەسێکی) لووتبەرز، بەپۆز، بەترووتوپ، ترزل، فیزن، خۆگر ◌ افادەای
**highness** /'haınəs/ *noun*
بەرزی، بەرزایی، بڵیندی، گەورەیی ◌ بلندی، ارتفاع، بزرگی
**high-octane** *adjective*
(بێنزین) هەرەباش، یەکجارچاک ◌ سوپر
**high-pitched** /ˌhaı 'pıtʃt/ *adjective*
1 (دەنگ) زەنگوڵی، تیژ، زریکەناسا، قیژەئاسا: 2 لێز (اوی)، *a high-pitched voice/whistle* توند، لاپێ، تەلان ◌ 1 زیر، جیغ‌مانند 2 تند
**high point** *noun*
گرنگ‌ترین، خۆش‌ترین و سەرنج‌ڕاکێش‌ترین بەشی شتێ، خۆشایی، سەرگوڵ ◌ مهم‌ترین، جذاب‌ترین قسمت چیزی
**high polymer** *noun*
(کیمیا) پۆلیمێری بەرز (پۆلیمێری کە کێشی گەردی‌یەکەی لەسەری بێ و لە بواری سازکردنی پلاستیک و ڕیزیندا بەکاردێتن) ◌ های پولیمر
**high-powered** *adjective*
1 پڕهێز، بەهێز، بەکێش، بەقەوەت: *a high-powered car/computer, etc.* 2 هەڵسووڕ، بەجموجۆڵ، پڕوزە، بەکار: *high-powered executives* 3 گرنگ 4 سەرکەوتوو، باوەڕپێکراو: *a high-powered job* ◌ 1 پرقدرت 2 پرجنب‌وجوش، پرانرژی 3 مهم 4 موفق
**high-pressure** *noun*
(کەش‌ناسی) گوشارزۆر، پەستان‌زۆر ◌ فرابار
**high-priced** *adjective*
گران، گرانبایی، زۆر: *high-priced housing/cars* ◌ گران‌قیمت
**high priest** *noun*
گەورەقەشە ◌ کشیش اعظم
**high-principled** *adjective*
بەئابڕوو، ڕەوشتبەرز، بەئابوور، پێبەند بە ڕێ‌وشوێن، ئاکاربەرز، بەئابڕووانە، ئابڕوومەندانە ◌ شرافتمندانە
**high profile** *noun*
ناوبانگ، ناوودەنگ ◌ شهرت
**high-ranking** *adjective*
پایەبەرز، پلەبەرز، گەورە: *a high-ranking officer/official* ◌ عالی‌رتبە
**high relief** *noun*
(پەیکەرتاشی) نەخشی تەواوەدەرهاتوو ◌ نقش تمام‌برجستە
**high-rise** *adjective, noun*
*adj* (خانووبەرە) بڵیند، هەوابڕ، بەرز: *high-rise housing* *n* خانووبەری بڵیند یان چەندنهۆم ◌ *adj* بلند *n* آسمان‌خراش
**high risk** *noun*

مەترسـی گـەورە (مـەرگ، برینـداری و بەرشکستی) ◌ خطر بزرگ

**highroad** *noun*
1 ریگـای سـەرەکی، شـارێ، ریگاوبـان 2 بـاش‌تـرین رێ، سەرراسـت‌تـرین یـان راستەوخۆترین ریگا ◌ 1 راه اصلی 2 بهترین راه

**high roller** *noun*
دەسبلاو (ب.ت. لە قومار‌دا) ◌ ولخرج

**high school** *noun*
خویندنگای ئامادەیی ◌ دبیرستان

**the high seas** *noun, pl.*
دەریـا ئازادەکـان یـان بـێ‌خاوەنـەکان (لـەژێر کۆنترۆلـی قـانوونی هـیچ ولاتـێ نـەبێ): *international laws to regulate fishing on the high seas* ◌ آب‌های بین‌المللی

**high season** *noun*
(بریتانیـا) وەرزی پـشوو، پـشووان ◌ فـصل تعطیلات

**high society** *noun*
چـینی ئەریـستۆکرات، گـەورەزادەکان، چـینی سەرەوەی کۆمەلگا ◌ اشراف

**high-sounding** *adjective*
(زمان و هتد) گران، بەهەلـەدابەر، تەق‌ورەق ◌ پرطمطراق

**high-speed** *adjective*
تونرەو، زۆرخێرا ◌ سریع، سریع‌السیر

**high-spirited** /ˌhaɪ ˈspɪrɪtɪd/ *adjective*
1 بەکەیف، سەرخۆش، بەدەماخ، بەرزەدەماخ، لەشـەوق 2 ئـازا، نـەترس، بەجـەرگ 3 سـل، رەفـۆک، قوشـقی، سرک، رەوەک، تۆر (high-spiritedness *n* high-spiritedly *adv*) ◌ 1 سرحال 2 شجاع 3 چموش

**high spot** *noun*
1 رووداوی گرنـگ، بوویـەری بـەرچاو 2 تایبەتمەندی دیار و بەرچاو ◌ 1 رویداد مهم 2 ویژگی مهم

**high street** *noun*, US main street
شـەقامی سـەرەکی: *high-street banks/shops* ◌ خیابان اصلی

**high-strung** = highly-strung

**high table** *noun*
بـەرزەمیز، میـزی کەسـانی گرنـگ (بـۆ نـان خواردن) ◌ میز غذای افراد مهم

**high tea** *noun*
شێو (سووک)، عەسرۆژە ◌ شام

**high tech** *noun, adjective*, also hi tech
*n* تیکنۆلـۆژی پێـشکەوتوو *adj* تێـک‌بـەرز، بـە تیکنۆلۆژی پێشکەوتووەوە ◌ *n* فناوری پیشرفته *adj* دارای فناوری ابتدایی

**high technology** *noun*
1 تیکنۆلۆژی سـەرتر، تیکنۆلۆژی پێشکەوتوو 2 پەرەسـەندنی تیکنۆلـۆژی پێـشکەوتوو ◌ 1 فناوری پیشرفته 2 توسعەی فناوری پیشرفته

**high-tension** *noun*
پرتەوژم، فۆلتاژلەسەر(ێ)، فۆلتاژبالا ◌ فشارقوی

**high tide** *noun*
خێـزاو، هەلکـشاف، سـەرترین رادەی خێـزاو، ئەوپەری خێزاو: *You can't walk along this beach at high tide* ◌ برکشند، اوج برکشند

**high time** *noun*, it's high time
سەری وەخت، بە وەختی خۆی ◌ سرموقع

**high treason** *noun*
ولاتفرۆشـی، جاشـی‌گـەری، خەیانـەت بـە نیشتمان، گەورەناپاکی ◌ خیانت به میهن

**high-up** *noun*
(نافەرمی) مرۆی پایەبەرز یان دەس‌رۆیشتوو ◌ آدم عالی‌رتبه

**high water** *noun*
خێزاو، هەلکشاف، رادان ◌ برکشند

**high-water mark** *noun*
هێل یـان نیـشانەی خێزاو، نیشانەی بـەرزترین ئاستی ئاوهاتووسـەر (کـە ئـاو تـا ئەوێنـە هاتبێتـە سەر) ◌ خط مد

**highway** /ˈhaɪweɪ/ *noun*
شـارێ، سـەرەرێ، گـەورەرێ، ریگـای سـەرەکی ◌ بزرگ‌راه

**Highway Code** *noun*
1 (لـە بریتانیـا) رێ‌وشـوێنی لێخـورین، ریـسای لێخـورین 2 ریـسانامەی لێخـورین، کتێبـێ کـە ریساکانی لێخورینی تیایێ ◌ 1 مقررات رانندگی 2 آیین‌نامەی رانندگی

**highwayman** /ˈhaɪweɪmən/ *noun, pl.* highwaymen
ریگر، جەردە، تژدەقان ◌ راهزن

**highway patrol** *noun*
پۆلیـسی سەرەرێ ◌ گشت بزرگ‌راه

**highwire** *noun*
(تەناف‌بازی) تەناف، پەت ◌ طناب، بند

**hijab** /ˈhidʒab/ *noun*
خۆداپۆشین (بنەرەت: لە *ḥajaba* عـەرەبی‌یـەوە) ◌ حجاب

**hijack** /ˈhaɪdʒæk/ *noun*
1 فرۆکـەرفێنی، فرۆکـەدزی، فرۆکـەگری 2 هەلـگرتن، دزی (کـەل‌وپـەل لـە ماشـێن) ◌ 1 هواپیماربایی 2 هیجاک

**hijacker** /ˈhaɪdʒækə(r)/ *noun*
فرۆکەگر، فرۆکەرفێن، فرۆکەدز ◌ هواپیماربا

**hijacking** *noun*
فرۆکەرفێنی، فرۆکەدزی، فرۆکەگری: *There have been a series of hijackings recently in the area* ◌ هواپیماربایی

**Hijra** = Hegira

**hike** /haɪk/ *noun*
1 پیـادەڕەوی، پیادەڕۆیـیە پیاسـە، راوێچکـە 2 زۆربوون، چوونەسـەری: *a tax/price hike* ◌ 1 پیادەروی 2 افزایش

**hiker** /'haɪkə(r)/ *noun*
ڕێگاڕەو، پیاسەکار، پیاسەچی ◌ پیادرویکننده

**hiking** /'haɪkɪŋ/ *noun*
پیـادەڕەوی، پیـادەڕۆیی، پیاسـە، راوێچکـە: *to go hiking* ◊ *hiking boots* ◌ پیادەروی

**hila** = plural form of hilum

**hilar** /'hʌɪlə/ *adjective*
سەربە helum و helus ◌ وابسته بـه helum و helus

**hilarious** /hɪ'leəriəs, US -'ler-/ *adjective*
1 پێکەنینی، قۆشمە، گاڵتەجاڕ: *a -s joke/story* 2 (میـوانی) شـلوق، گـەرم، پڕقیژەوهـەرا (hilariousness *n*) ◌ 1 مضحک 2 پرسروصدا

**hilariously** /hɪ'leəriəsli, US -'ler-/ *adverb*
پێکـەنینییانـە، قۆشمانـە، گاڵـتەجاڕانە: *hilariously funny* ◌ به طور خندەدار

**hilarity** /hɪ'lærəti/ *noun*
خۆشی، شادی، قاقای خۆشی ◌ سرور، شـادی، قهقهەی شادی

**hill** /hɪl/ *noun*
1 تەپۆلکە، تەپە، گرد، زورک، کەژ، گوژمە، گر، گدو، زینوو 2 لێژایی، سەرەولێژی، تەلان، لاپێ، لێژ 3 کۆما، لۆدە ◌ 1 تپه 2 سربالایی 3 تل

**hillbilly** /'hɪlbɪli/ *noun, pl.* hillbillies
بنیـادەمی دێهـاتی، دەشـتەکی، لادێیـی (ب.ت. باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەمریکا) ◌ آدم دهاتی

**hill climb** *noun*
تەپەبڕکێ: پێشـبڕکێ بە ماشـێن بەسـەر تـەپ و گـردا (hill climber or hill-climber *n*): تەپەبڕکێوان؛ hill-climbing *n*) ◌ هیل‌کلایمب

**hill mynah** *noun*
خورمـاخۆرە یـان ماینـای تـەپ [*Gracula religiosa*] ◌ نوعی مرغ مینا

**hillcock** /'hɪlək/ *noun*
(باڵندەناسی) کەودەری ◌ هیل‌کوک

**hillock** /'hɪlək/ *noun*
1 تەپۆلـکە، تەپۆکـە، تەپۆڵـە، زوور، گردۆلکـە، بـتوو، هـەدەف، گدوک، گردەڵـە، وردەزورک، تەپی چکۆلانە 2 کۆما، کۆگا، لۆدە ◌ 1 تپـەی کوچک، پشته 2 تل

**hillside** /'hɪlsaɪd/ *noun*
بناری تەپ، یاڵ، لێژایی یان سەرەوخواری گرد، قەدی تـەپ، پاڵـی شـاخ، داوێن زورک: *Our hotel was on the hillside overlooking the lake* ◌ دامنەی تپه

**hilltop** /'hɪltɒp, US -tɑ:p/ *noun*
سـەرگرد، نـووکی تەپـە، نووچکـەی زورک ◌ نوک یا سر تپه

**hillwalking** /'hɪlwɔ:kɪŋ/ *noun*
تەپـەڕەوی، زورکڕەوی، گـردەڕەوی (بـۆ خۆشی) ◌ هیل‌ولکینگ

**hillwalker** *noun*
تەپـەڕەو، زورکڕەو، گـردەڕەو، تەپەگـەڕ ◌ هیل‌ولکر

**hilly** /'hɪli/ *adjective* (hillier or hilliest)
1 تەپـەلان، زورکـاوی، تەپـەڵان، بەندەڵـەبەند، پڕتـەپ، تەپاوتـەپ، تـەپ‌تـەپ، پڕکەندولەند 2 سەرەوخواری ◌ 1 پر از تپه 2 سراشیب

**hilt** /hɪlt/ *noun*
(شمـشێر، خـەنجێر و هتـد) کلـک(ە)، دەسـک، قولفە، چەمبەری، قەفت، جێ‌دەس، مشتە، مشتۆ (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ دسته

**hilum** /'hʌɪləm/ *noun, pl.* hila /-lə/
1 (ڕووەکناسـی) جـێ‌پێوەسـت، جـێ‌متوربـە، ناوکە، چاو (لە باقلەدا) 2 (توێکاری) جێگـای چوونـەنێو یـان هاتنـەدەری ڕەگ یـان ڕیـشاڵی دەماری، ناوکە ◌ 1 پیوندگاه 2 هلیوم یا هلیوس

**him** /hɪm/ *pronoun*
(جێناوی بەرکاری، سێیەم کەسی تاکی نێر) ئەو ◌ او را، به او

**himation** /hɪ'matɪɒn/ *noun*
هیماتیۆن: سـەربەرگێ کە یۆنانیانی زوو لەسـەر شـانی چـەپ و ژێر شـانی ڕاست دەیـانپۆشـی (بنەڕەت: لە یۆنانییەوە) ◌ هیماتیون

**himself** /hɪm'self/ *pronoun*
1 (جێنـاوی گەڕانـەوەیی(خۆیی)، سـێیەم کەسـی تاکی نێر) خۆی، لەخۆی 2 (جێناوی جـەختی) بەخۆی ◌ 1 (ضـمیر انعکاسـی) خـودش را، بـه خودش، از خودش 2 (تأکیدی) خودش

**hin** *noun*, Hebrew *hīn*, from Egyptian *hnw*
پێوانەیـەکی کـۆنی شـلەی جوولەکـە کـە دەورووبەری 5 لیتر (یان 5.7 لیتر) دەگرێ (نزیک گالۆنێ یان 1½ گالۆن) ◌ هین

**Hinayana** /ˌhi:nə'jɑ:nə/ *noun*, also Hinayana Buddhism or Theravada
هینایانا، ڕەوڕەوە یـان چـەرخی مـەزن، تێراڤادا، بودایزمی هینایانا: لقی کۆنەپارێزی بودایزم کە کۆمەڵە تیرەیێ لە سریلانکا، میانمار (بورمە)، تایلـەنـد، لائـۆس و کامبوجیـا Cambodia دەگرێتەوە، پێ لەسـەر ڕزگاری تاکەکەسی (بە ڕێگای حەولی خۆیەوە) دادەگرێ (بنەڕەت: لە سانـسکریتەوە: *hīna* "چکۆلـەتـر، خـوارتر" + *yāna* "دەزگـا، وەسـیلە"، بڕوانـە mahayana؛ Theravada: لە *theravāda* پالییەوە "ڕێبازی گەورەترەکان"، لە *thera* "old ،elder" + *vāda* "doctrine ،speech") ◌ هینایانا

**Hinayanist** *noun*
هینایانیست، هینایاناباوەڕ ◌ هینایانیـست

**Hinayanistic** *adjective*
هینایانیستی، هینایاناباوەڕانە ۞ هینایانیستی
**hind**[1] /haɪnd/ *adjective*
پشتەوە، دواوە، پاشوو، پاشەوە ۞ عقب، پسین
**hind**[2] /haɪnd/ *noun*
ئاسکەمێ، ماسک (ب.ت. سوور و سێ‌ساڵ بەدواوە) ۞ گوزن ماده
**hind**[3] /haɪnd/ *noun*
1 (کۆن، پتر لە سکاتلەند) ڕەنجبەر، کرێکاری کارامەی کێڵگە، بەردەستی کشتوکاڵ 2 دەشتەکی، لادێیی ۞ 1 کارگر ماهر کشتزار 2 روستایی
**hindbrain** /ˈhaɪndbreɪn/ *noun*
(توێکاری) پاشەمێشک ۞ مغز عقبی
**hinder** /ˈhaɪndə(r)/ *adjective*
پشتەوە، دواوە، پاشەوە، دواتر ۞ عقب، پسین
**hindhead** *noun*
پشتەوەی سەر، پشتەسەر ۞ عقب سر
**Hindi** /ˈhɪndi/ *adjective, noun*
*adj* هیندی *n* زمانی هیندی (ب.ت. لە باکووری هیندوستان؛ بنەڕەت: لە *hindī* ئۆردو-وەوە، لە *Hind* ("India") ۞ *adj* هندی *n* زبان هندی
**hindmost** /ˈhaɪndməʊst/ *adjective*
دواترین، پاش‌ترین، دوورترین ۞ عقب‌ترین، دورترین، آخرین
**hindquarters** /ˌhaɪndˈkwɔːtəz, US -ˈkwɔːrtərz/ *noun, pl.*
پاشوو، پاشەڵ، بەشی دواوەی چوارپێکان، بەشی دواوەی گیانەوەر ۞ بخش پسین جانور
**hindrance** /ˈhɪndrəns/ *noun*
1 کۆسپ، ڕێگر، ئاستەنگ، ملۆزم 2 بەرگیری، ڕێ‌گرتن، نەهێشتن ۞ 1 مانع، سد راه 2 ممانعت
**hindsight** /ˈhaɪndsaɪt/ *noun*
1 تێڕوانینەوە 2 تێگەیشتنی دواتر ۞ 1 بازنگری 2 ادراک ماوقع
**Hindu** /ˈhɪnduː, US ˌhɪnˈduː/ *noun, adjective*
*n* هیندی، کە دینەکەی هیندوئیزم بێ *adj* هیندو، هیندی، سەربە هیندووەکان یان هیندوئیزم ۞ *n* هندو *adj* وابسته به هندوها یا هندوئیسم
**Hinduism** /ˈhɪnduːɪzəm/ *noun*
دینی هیندو، ئایینی هیندی ۞ آیین هندو
**Hindustani** /ˌhɪndʊˈstɑːni/ *noun, adjective*
*n* 1 کۆمەڵە زمان یان شێوەزاری (زۆرتر هیندی و ئۆردو) باکووری ڕۆژاوای هیندوستان کە لینک دەگەن 2 شێوەزاری دیلهی هیندیّ کە زۆرتر وەکوو زمانێکی هاوبەش لە سەرتاسەری هیندوستاندا قسەی پێدەکرێ *adj* سەربە چاند و کولتوری باکووری ڕۆژاوای هیند ۞ هندوستانی
**Hindutva** /hɪnˈdʊtvə/ *noun*
هەستی بەهێزی هیندی‌گەری ۞ هندوتوا
**hinge** /hɪndʒ/ *noun*
1 لاولاوە، دوولایی، ئەنجامە 2 (خوازە) تەوەر، بنەڕەت، بنەما، جەمسەر ۞ 1 لولا 2 محور، قطب، اصل
**hinged** *adjective*
لاولاوەدار، لاولاوەبەند، لاولاوەپێوەبوو، لاولاوەڕێز، ئەنجامەدار، دوولایی‌ڕێز ۞ دارای لولا
**hinge joint** *noun*
جومگەی لاولاوەیی یان ئەنجامەیی (وەک ئانیشک) ۞ مفصل لولایی
**hinky** *adjective*, (hinkier, hinkiest)
(ئەمریکا، نافەرمی) 1 nervous، jittery 2 suspicious ۞ هینکی
**hinny** /hɪni/ *noun, pl.* hinnies
1 حیلە 2 قاتر (لە ماکەر و نێرەئەسپ، بڕوانە mule[1]) ۞ 1 شیهه 2 قاطر
**hint** /hɪnt/ *noun*
ئاماژە، بەگوێ‌دادان، مێزە، پلار، لاپلار، نیشانە، کورتەئاماژە ۞ کنایه، اشاره، اثر
**hinterland** /ˈhɪntəlænd, US -tərl-/ *noun*
پشت‌ڕووبار، پشت‌کەنار، دوورەچۆم: *the rural/agricultural hinterland* ۞ پس‌کرانه
**hip**[1] /hɪp/ *noun*
1 کلۆت، کەفەڵ، هێفەڵ، سمت، هێت (لە لێک‌دانا)-hipped: *slim- large-hipped* (*hipped*) 2 جومگەی ران، ئەسکنج 3 لێوار یان گۆشەی پێک‌گەیشتنی دوو لای لێژی سەربانێ ۞ 1 کفل، باسن 2 مفصل ران 3 هیپ
**hip**[2] /hɪp/ *noun*, also rose hip
میوە یان بەری گوڵەباخ ۞ میوەی گل سرخ
**hip**[3] /hɪp/ *adjective (*hipper, hippist*)*
مۆدپەرست، داب‌خواز، داب‌پەرست، مۆدباز: *the hippest club in town* ۞ اهل مد
**hipbath** *noun*
لەگەنی چکۆلە (بۆ تیادانیشتن نە ڕاکشان) ۞ وان کوچک
**hipbone** *noun*
ئێسکی سێ‌بەندە یان کلۆت، سمتەجوولە ۞ استخوان لگن‌خاصره
**hip joint** *noun*
جومگەی ئێسکی سێ‌بەندە یان کلۆت، دیزەڵ، دیزەڵ، جومگەی ران ۞ مفصل استخوان لگن‌خاصره و ران
**hip flask** *noun*
بوتڵ، گی(ر)فانی (بۆ ئارەق و شتی وا تیاهەڵگرتن، لە گیرفاندا جێی دەبێتەوە) ۞ بطری
**hip, hip, hooray** *interjection*
هیپ هیپ هورای ۞ هیپ هیپ هورای
**hip hop** *noun*

هیپ‌هاپ: جۆرێ موسیقای دەنسی گەلی بە ترپە و ریتمێکی توندەوە و قسەشی تیادەکرێ ◌ هیپ‌هاپ

**hiphuggers** = hipsters

**hipparch** /ˈhɪpɑːk/ *noun*

(یۆنانی کۆن) سەرۆکی سپای سوارە، سەرسپای سوارە ◌ هیپارچ

**hipp(o)-** *prefix*

پێشگر: ئەسپ (بنەڕەت: لە *hippos* یۆنانی "horse") ◌ پیشوند: اسب

**hippie** /ˈhɪpi/ *noun, pl.* hippies

هیپی (ب.ت. لە شەستەکاندا، ئەمانە باوەڕیان بە ئازادی سێکسی یان زایەندی بووە و نرخ و بەهای نەریتی کۆمەڵایەتی‌یان رەت دەکردەوە و لایەنگری‌یان لە ئاشتی و خۆشەویستی دەکرد و جاروبار بە شێوەی خێزانێکی گەورە بە ناوی "communes" دەژیان، رواڵەت و بیچمێکی نائاسایی‌یان یان ناباویان هەبوو) ◌ هیپی

**hippo** /ˈhɪpəʊ, US ˈhɪpoʊ/, *pl.* same or hippos = hippopotamus

**hip pocket** *noun*

گیرفانی پشتەوەی شەڵوار ◌ جیب پشت شلوار

**hippocras** /ˈhɪpəkras/ *noun*

مەی هەزوێلەتێ‌کراو، بادەی داودەرمان‌تێکەڵ ◌ شراب ادویه‌زده

**Hippocratic oath** /ˌhɪpəkrætɪk ˈəʊθ, US ˈoʊθ/ *noun*

سوێندنامەی بوقرات، سوێند و بەڵێنی پزشکی ◌ سوگند عهد پزشکی

**Hippocrene** /ˈhɪpəkriːn/ *noun*, Latin, from Greek *Hippokrēnē*

1 ناوی کانی‌یێ لەسەر کێوی Helicon، کە بۆ Muses پیرۆزە و سەرچاوەی هەوێنی هونراوە و شیعری‌یە 2 ئیلهام یان سەرۆی وێژەیی یان هۆنراوەیی ◌ 1 هیپوکرن 2 الهام ادبی یا شعری

**hippodrome** /ˈhɪpədrəʊm, US -droʊm/ *noun*

1 هۆڵی موسیقا یان هەڵپەرکێ، تیاتر و سینەما 3 (یۆنان و رۆمی کۆن) گۆرەپانی پێشبڕکێی ئەسپ و ئەرابەسواری ◌ 1 تالار 2 هیپودروم

**hippogriff** /ˈhɪpə(ʊ)grɪf/ *noun*, also hippogryph

هیپۆگریف (گیانەوەرێکی ئەفسانەیی بە لەشی ئەسپ و سەر و باڵی هەڵۆشێرەوە griffin) ◌ هیپوگریف

**hippoid** *adjective*

ئەسپی، ئەسپ‌ئاسا، شێوەئەسپ ◌ اسب‌مانند

**hippologist** *noun*

ئەسپناس ◌ اسب‌شناس

**hippology** /hɪˈpɒlədʒɪ/ *noun*

ئەسپناسی ◌ اسب‌شناسی

**Hippolyta** *noun*, Latin, from Greek *Hippolytē*

هیپۆلیتا: شاژنی ئامازۆنەکان Amazon کە لە لایەن هێرکولەوە Hercules بووە ژنی تیسۆس Theseus ◌ هیپولیتا

**Hippolytus** *noun*, Latin, from Greek *Hippolytos*

هیپۆلیتۆس: کوڕی Theseus بە هەڵە تاوانبار کرا بە تێکەڵبوون لەگەڵ زڕدایکی و لە لایەن باوکی‌یەوە کوژرا ◌ هیپولیتوس

**Hippomenes** *noun*, Latin, from Greek *Hippomenēs*

هیپۆمێنیز، هیپۆمێنیس: داواکاری suitor سەرکەوتووی Atalanta لە میتۆلۆژی یۆنانی‌دا ◌ هیپومنس

**hippophagous** /hɪˈpɒfəgəs/ *adjective*

(گۆشت) ئەسپ‌خۆر ◌ اسب‌خور

**hippophagy** /hɪˈpɒfədʒɪ/ *noun*

ئەسپ‌خۆری، خواردنی گۆشتی ئەسپ ◌ اسب‌خوری

**hippophile** /ˈhɪpəfaɪl/ *noun*

ئەسپ‌خۆشەویست، ئەسپ‌دۆست ◌ اسب‌دوست

**hippopotamus** /ˌhɪpəˈpɒtəməs, US -ˈpɑːtə-/ *noun, pl.* hippopotamuses or hippopotami /-mʌɪ/

(گیانەوەرناسی) ئەسپی گۆمی، گامێشی دەریایی، ئەسپ (یان مایینی)ی رووبار، کەرگەدەن، ئەسپی ئاوی [*Hippopotamus amphibius* و *Choeropsis liberiensis* (هی گرگن)] ◌ اسب آبی

**-hippos** *suffix*

پاشگر: ئەسپ (بنەڕەت: لە *hippos* یۆنانی‌یەوە "horse") ◌ پسوند: اسب

**hippurate** *noun*

خوێ یان ئێستێری ترشەڵۆکی هیپیۆریک یان هیپۆریک ◌ هیپورات

**hippuric acid** /hɪˈpjʊərɪk/ *noun*

ترشەڵۆکی میزین یان هیپۆریک یان میزەئەسپین (ترشەڵۆکێکی ئەندامی، لە میزی گیانەوەرانی گیاخۆر و گوانداراني ترا هەیە؛ بنەڕەت: لە *hippos* یۆنانی "ئەسپ" + *ouron* "میز" + -ic) ◌ اسید هیپوریک

**hippy** = hippie (hippiedom *n*, hippiness *n*, hippyish *adj*)

**hip roof** *noun*

سەربانی خەرپشتەیی یا پشتەماسی، کووڕەک ◌ پشت‌بام سراشیب

**hipster** *adjective, noun*

*adj* (تافەرمی) نوێ‌خواز *n* ( hipsters /ˈhɪpstəz, -stərz/ ) *adj* ◌ تونکە *n* متجدد ◌ شلوار (در جمع) بالاکوتاه

**hipsterism** *noun*
(نافەرمی) نوێخوازی ۞ تجدد

**hiragana** /ˌhɪrəˈgɑːnə/ *noun*
هیراگانا (← ئەو کۆمەڵە نیشانەیە کە لە نووسینی ژاپۆنیدا بەکاردیتری) ۞ هیراگانا

**hircine** /ˈhɜːsʌɪn/ *adjective*
بزنی، بزنئاسا، شێوەبزن ۞ بزمانند

**hire** /ˈhaɪə(r)/ *noun*
کرێ، مز، حەق ۞ کرایە، اجرت، مزد

**hired girl** *noun*
کچی کارەکەر (ب.ت. لە کاروباری مووچەدا) ۞ دختر خدمتکار

**hired hand** *noun*
کرێکاری کێڵگە، پالە، فەعلا، رەنجبەر، سەپان ۞ کارگر کشاورزی

**hired man** *noun*
پیاوی کارەکەر (ب.ت. لە کاروباری مووچەدا) ۞ مرد خدمتکار

**hireling** /ˈhaɪəlɪŋ, US ˈhaɪərlɪŋ/ *noun, adjective*
بەکرێگیراو، کرێگرتە، مزەوەر ۞ مزدور

**hire purchase** *noun,* also installment plan
کرینی پاژی، کرینی بەپاژ ۞ خرید اقساطی

**hirer** *noun*
(بە)کرێگر، مزدەر؟ ۞ أجیرکننده

**hirsute** /ˈhɜːsjuːt, US ˈhɜːrsuːt/ *adjective*
1 کولکن، تیسکن، پرموو، پرتووک 2 داپۆشراو بە مووی زبر و رەق: *a hirsute leaf* ۞ 1 پشمالو، پرمو 2 هیرسوت

**hirsuteness** *noun*
کولکنی، پرمویی، تیسکنی، پرتووکی ۞ پشمالویی، پرمویی

**hirsutism** /ˈhɜːsətɪzəm/ *noun*
1 کولکنی، تیسکنی، پرتووکی، پرمووی، تووکنی 2 شینبوونی نائاسایی موو لە دەموچاو یان لەشی ژن ۞ 1 پشمالویی، پرمویی 2 هیرسوتیسم

**hirundine** /ˈhɪrʌndʌɪn, US hɪˈrʌndʌɪn/ *noun*
(باڵندەناسی) پەرەسێلکەیی، باڵندەیێ لە تیرەی پەرەسێلکە (Hirundinidae. بنەڕەت: لە لاتینی *hirundo* "swallow" + -ine[1]) ۞ پرستویی

**his** /hɪz/ *adjective, pronoun*
1 (ئاوەڵناوی خاوەنداری، سێیەم کەسی تاکی نێر) ـکەی، ئەو، هی ئەو 2 (جێناوی بەرکاری سێیەم کەسی تاکی نێر) ئەو، ـی ۞ 1 ـش، ـاو 2 مال او

**Hispanic** /hɪˈspænɪk/ *adjective, noun*
*adj* 1 سپانیایی-پۆرتوگالی 2 سپانیاییزمان (سپانیا و وڵاتانیتر کە لە سپانیایی قسە دەکەن) *n* خەڵکی سپانیا (لەو وڵاتانەی کە بە سپانیایی یان پۆرتوگالی ب.ت. وڵاتانی ئەمریکای لاتین قسە دەکەن) ۞ *adj* 1 اسپانیایی-پرتقالی 2 اسپانیولیزبان *n* اهل اسپانیا

**Hispanicism** /hɪˈspænɪsɪzəm/ *noun*
زاراوە یان وشەی سپانیایی ۞ اصطلاح یا واژەی اسپانیایی

**Hispanist** /ˈhɪspənɪst/ *noun,* also Hispanicist /hɪˈspanɪsɪst/
شارەزا یان خوێندکاری زمان و چاندی سپانیایی ۞ اصطلاح یا واژەی اسپانیایی

**Hispano-** /hɪˈspanəʊ/ *prefix*
پێشگر: سپانیایی، سپانیایی و... ۞ پیشوند: اسپانیایی، اسپانیایی و...

**hispid** /hɪspɪd/ *adjective*
(رووەکناسی و گیانەوەرناسی) مووداری، پرموو، درکاوی، تووکاوی، مووداری (زبر): *hispid leaves* ۞ مودار، خاردار

**hispidity** *noun*
مووداویبوون، درکاویبوون، تووکاویبوون، پرمووی، مووداری (زبر) ۞ موداری، خارداری

**hispidulous** *adjective*
مووداوی، درکاوی، تووکاوی، پرموو، موودار (زبر) ۞ مودار، خاردار

**hiss** /hɪs/ *noun*
جیز، گیز، فیشکە، فسەفس، فسکەفسک، فیشکەوهۆر، فشە، فشەفش: *the hiss of the air brakes* ۞ هیس، سوت، فشفش

**hist** /ˈhɪst/ *interjection*
دەنگ! هەرا! وست! سس! وسکوت! ۞ هیس!

**hist(o)-** /ˈhɪstəʊ, also hist- before a vowel *prefix*
پێشگر: شانە، ئەتەم، تەفن: *histophysiology* (لە یۆنانییەوە *histos* "web, tissue") ۞ پیشوند: بافت

**histamine** /ˈhɪstəmiːn/ *noun*
(پزشکی) هیستامین ۞ هیستامین

**histidene** /ˈhɪstɪdiːn/ *noun*
(زیندە(وەر)کیمیا) هیستیدین: ترشەلۆکی ئەمینۆ $C_6H_9N_3O_2$ کە پێکهێنەری constituent سەرەکی زۆربەی پرۆتینەکانە و ماکێکی بنەڕەتییە لە خۆراکی مرۆڤدا (بنەڕەت: لە یۆنانییەوە لەگەڵ *histos* -ide + -inc) ۞ هیستیدین

**histiocyte** /ˈhɪstɪə(ʊ)sʌɪt/ *noun*
(کارئەندامناسی) شانۆچکەخانە: جۆرێ خانەی بێگانەخۆری جێگیری (یان نەجووڵ) نێو بەستەرەشانە connective tissue (بنەڕەت: لە یۆنانی *histion* (چکۆلێنراوی *histos* "tissue") + -cyte) ۞ هیستیوسیت

**histiocytic** *adjective*
شانۆچکەخانەیی، سەربە هیستیۆسایت ۞ وابسته

به هیستیوسیت

**histochemical** *adjective*
سەربە کیمیای شانەیی histiochemistry ۞ وابسته به هیستوکمیستری

**histochemically** *adverb*
لەباری histiochemistry یەوە ۞ از لحاظ هیستوکمیستری

**histochemistry** *noun*
کیمیای شانەیی: زانستێ کە تکنیکەکانی biochemistry و histology تێکهەڵکێش دەکا تا لەبارەی پێکهاتە کیمیایی‌یەکانی شانەکان و خانەکان بکۆڵێتەوە، کیمیای شانەیی و خانەیی ۞ هیستوکمیستری

**histocompatibility** *noun*
(پزشکی) گونجان یان سازانی شانەیی: گونجان یان سازانی شانە جیاوازەکانی چەندین کەس لە نێوان یەکتردا ۞ هیستوکومپاتیبیلیتی

**histogenesis** *noun*, also histogeny
شانەپێکهاتن، دروس‌بوونی شانە، بەشانەبوون ۞ بافت‌زایی، تنسج

**histogram** /'hɪstəgræm/ *noun*, bar chart
هێڵکاری ئەستوونی یان ستوونی، دیاگرامی شیشی یان ئەستوونی یان ستوونی، هێڵکاری میلی ۞ نمودار ستونی

**histological** /ˌhɪstə'lɑːdʒɪkl/ *adjective*
شانەناسی‌یانە، سەربە شانەناسی ۞ بافت‌شناختی

**histologist** /hɪ'stɒlədʒɪst, US -'stɑːl-/ *noun*
شانەناس ۞ بافت‌شناس

**histology** /hɪ'stɒlədʒi, US -'stɑːl-/ *noun*
شانەناسی، لقێ لە زیندە(وەر)ناسی biology ۞ بافت‌شناسی

**histolysis** /hɪ'stɒlɪsɪs/ *noun*
شانەشی‌بوونەوە ۞ انحلال بافتی

**histolytic** *adjective*
شانەشی‌بوونەوەیی ۞ وابسته به انحلال بافتی

**histone** /'hɪstəʊn/ *noun*
(زیندەکیمیا) هیستۆن: هەریەک لە کۆمەڵێ پرۆتێینە بنەڕەتی‌یەکان کە لە کرۆماتین‌دا دۆزراونەتەوە ۞ هیستون

**histopathological** *adjective*
سەربە histopathology یان شانەنەخۆشی‌ناسی ۞ وابسته به histopathology

**histopathologist** *noun*
هیستۆپاتۆلۆژیست ۞ هیستوپاتولوژیست

**histopathology** /ˌhɪstəʊpə'θɒlədʒi, US ˌhɪstoʊpə'θɑːl-/ *noun*
زانستی نەخۆشی‌یەکانی شانە، نەخۆشی‌شانەناسی، شانەنەخۆشی‌ناسی ۞ علم بیماری‌های بافتی

**histophysiology** *noun*
1 کارئەندام‌ناسی شانە، شانەفرمان‌ناسی 2 ڕێکخستە و کارکرد و ئەرکی شانەکان (histophysiolgical or -stophysiolgic *adj*) ۞ 1 فیزیولوژی بافتی 2 کارکرد و سازمان بافت‌ها

**histoplasmosis** *noun*
(پزشکی) جۆرێ نەخۆشی هەناسەدان respiratory نیشانەکانی وەک هی influenza وان و بەهۆی کەڕوو یان کارگێ fungus بە ناوی (*Histoplasma capsulatum*) تووش دەبێ کە لە ڕیقنەی باڵندەکان و شەمشەکوێرەکان‌دا لە شوێنی تەڕەشۆ و نمدار دایە ۞ هیستوپلاسموز

**historian** /hɪ'stɔːriən/ *noun*
1 مێژوونووس، مێژووزان، دیرۆکڤان 2 مێژووزان 3 خوێندکاری مێژوو ۞ 1 تاریخ‌نویس، مورخ 2 تاریخ‌دان 3 دانشجوی تاریخ

**historic** /hɪ'stɒrɪk, US -'stɔːr-, -'stɑːr-/ *adjective*
1 مێژوویی، دیرۆکی، گرنگ، بەناوبانگ یان گرنگ لەباری مێژوویی‌یەوە: *historic* *a -toric occasion* ◊ *battlefields* 2 شوێن یان خانووبەرەی مێژوویی 3 (ڕێزمان، سەردەمێ) بۆ گێڕانەوەی ڕووداوە ڕابردووەکان بەکاردێتێ، ب.ت. لە ڕابردووی دوور و ڕابردووی سادەی پێکنەهاتووی لاتین و یونانی ۞ 1 تاریخی، مهم 2 مکان یا بنای تاریخی 3 هیستوریک

**historical** /hɪ'stɒrɪkl, US -'stɔːr-, -'stɑːr-/ *adjective*
مێژوویی، دیرۆکی، سەربە مێژوو: *the* ◊ *historical background to the war* *a* ◊ *historical documents/records/research* ۞ تاریخی، وابسته به تاریخ *historical novel*

**historical determinism** *noun*
دیتێرمینیزمی مێژوویی ۞ جبرگرایی تاریخی

**historical determinist** *noun*
دیتێرمینیستی مێژوویی ۞ جبرگرای تاریخی

**historical development** *noun*
پەرەسەندنی مێژوویی ۞ تکامل تاریخی

**historical dynamism** *noun*
داینەمیزمی مێژوویی، دینامیزمی مێژوویی ۞ دینامیسم تاریخی

**historical epoch** *noun*
سەردەمی مێژوویی، قۆناخی مێژوویی ۞ دوره‌ی تاریخی

**historical interpretation** *noun*
لێکدانەوەی مێژوویی، ڕاڤەی مێژوویی ۞ تعبیر تاریخی

**historically** /-kli/ *adverb*
لەباری مێژوویی‌یەوە، لە بواری دیرۆکەوە: *The book is -cally inaccurate* ۞ از لحاظ تاریخی

**historical materialism** *noun*
ماتریالیزمی مێژوویی ۞ ماتریالیسم تاریخی

**historical materialist** *noun*
ماتریالیستی مێژوویی ◌ ماتریالیست تاریخی
**historical method** *noun*
شێواز یان ڕێبازی مێژوویی ◌ روش تاریخی
**historical methodology** *noun*
شێوازناسی مێژوویی، مێتۆدۆلۆژی مێژوویی ◌ روش‌شناسی تاریخی
**historical necessity** *noun*
پێویستی مێژوویی، پێداویستی مێژوویی ◌ ضرورت تاریخی
**historical perspective** *noun*
ڕوانگەی مێژوویی ◌ دیدگاه تاریخی
**historical process** *noun*
ڕەوتی مێژوویی، پرۆسەی مێژوویی ◌ فرایند تاریخی
**historicism** /hɪ'stɒrɪsɪzəm, US -'stɔːr-, -'stɑːr-/ *noun*
مێژووگەری، مێژووخوازی، مێژووباوەڕی ◌ تاریخ‌گرایی
**historicist** /hɪ'stɒrɪsɪst, US -'stɔːr-, -'stɑːr-/ *noun*
مێژووگەر، مێژووخواز، مێژووباوەڕ (historicistic *adj*) ◌ تاریخ‌گرا
**historicity** /ˌhɪstə'rɪsɪti/ *noun*
مێژوومەندی، مێژوویێتی، دێرۆکیبوون، ڕەسەنایەتی مێژوویی، واقیعەتی مێژوویی ◌ تاریخ‌مندی، اصالت تاریخی، واقعیت تاریخی
**historic present** *noun*, also historical present
سەردەمی ئێستای مێژوویی (سەردەمی ئێستای سادە کە لە هێندێ زماندا بۆ باس کردنی ڕووداوەکان لە ڕابردوودا بەکاردێتێ) ◌ زمان حال تاریخی
**historiographer** *noun*
مێژوونووس ◌ تاریخ‌نگار
**historiographical** /hɪˌstɒriə'græfɪkl, US -ˌstɔːr-, -ˌstɑːr-/ *adjective*
سەربە مێژوونووسی ◌ وابسته به تاریخ‌نگاری
**historiography** /hɪˌstɒri'ɒgrəfi, US -ˌstɔːri'ɑːg-, -ˌstɑːr-/ *noun*
مێژوونووسی ◌ تاریخ‌نگاری
**historiologist** *noun*
مێژووناس ◌ تاریخ‌شناس
**historiology** *noun*
مێژووناسی ◌ تاریخ‌شناسی
**history** /'hɪstri/ *noun, pl.* histories
1 مێژوو، دێرۆک، زووینە 2 سەربردە، ڕابووری؛ ڕابردوویێکی پڕ ڕووداو یان گرنگ 3 تۆماری بەردەوام و کرۆنۆلۆژیکی ڕووداوەکانی ڕابردوو (بنەڕەت: بە ڕێگای لاتینەوە، لە *historia* یونانی "history ،narrative"، لە *histōr* بەوە "learned، پیاوی ژیر wise man") ◌ 1 تاریخ 2 شرح‌حال؛ گذشته‌ی پرحادثه 3 هیستوری
**histosol** /'hɪstəsɒl/ *noun*
(خاکناسی) جۆری خاک یان گڵی پیت‌دار peaty بە سەرتوێیێکی قووڵی تەواو ماکی ئەندامی organic material ◌ هیستوسول
**histrionic** /ˌhɪstri'ɒnɪk, US -'ɑːnɪk/ *adjective*
1 شانۆیی، سەربە شان 2 دەسکرد، ساختە، شانۆیی، ڕیایی، خۆپیشاندەرانە، درۆ ◌ 1 وابسته به نمایش 2 ساختگی، نمایشی
**histrionically** /-kli/ *adverb*
شانۆیانە، بە شێوەیێکی شانۆیی، خۆدەرخەرانە ◌ به طور نمایشی، متظاهرانه
**histrionism** *noun*
ڕوالەت‌بازی، خۆوانیشان‌دان، ڕیایی ◌ وانمودسازی
**histrionics** *noun, pl.*
1 شانۆگەری 2 هەڵسوکەوتی درۆ یان خۆوانیشان‌دەرانە، ڕەفتاری درۆیانە، ڕوالەت‌بازی ◌ 1 نمایش 2 تظاهر، رفتار ساختگی
**hit**[1] /hɪt/ *noun*
1 لێدان، پیاکێشان، گورز 2 لێکەوتن، پێکا، ئەنگاوتن، لێدان، لێکدان، پێکادان، پێکاکێشان 3 سەرکەوتن 4 کاری سەرکەوتووانە 5 کوشتن 6 لێدانی تۆپ (لە بەیسبۆڵدا) 7 تانە، تەشەر، پلار، توانج ◌ 1 ضربه 2 خوردن، اصابت 3 موفقیت 4 عمل موفق‌آمیز 5 قتل 6 طعنه، کنایه
**hit**[2] /hɪt/ = past and past participle of hit
**hit and miss** *adjective*
شانسی، بەختەکی ◌ شانسی
**hit-and-run** *adjective*
(لێکدانی ماشێن) لێدە و هەڵێ ◌ بزن و در رو
**hitch** /hɪtʃ/ *noun*
1 تەکان، پاڵ 2 گرێ (قوڵفە) 3 وێستان 4 گیر، کێشە، گیرێ، قۆرت، گرفت 5 (نافەرمی و ئەمریکا) ماوەی سەربازی ◌ 1 تکان، هل 2 گره 3 ایست 4 مشکل 5 مدت سربازی
**hitchhiker** /'hɪtʃhaɪkə(r)/ *noun*
بەخۆڕایی‌سواربوو ◌ اتواستاپ‌زن
**hi-tech** = high tech
**hither** /'hɪðə(r)/ *adverb, adjective*
*adv* (کۆن و وێژەیی) لەم شوێنە، لێرە، بەم لاوە، نزیک‌تر: *People began rushing hither and thither* *adj* هەڵکەوتوو لەم لاوە یان بەم لاوە ◌ *adv* بدین‌جا، بدین سو *adj* واقع در این سو
**hither and thither** *adverb*
ئەم‌لاو ئەولا، لێرەولەوێ ◌ این‌سوی و آن‌سوی
**hithermost** /ˌhɪðəməʊst/ *adjective*
نزیک‌ترین، تەواو بەم‌لاوە ◌ نزدیک‌ترین
**hitherto** /ˌhɪðə'tuː, US ˌhɪðər'tuː/ *adverb*

تا ئێستا، هەتانووکە ◌ تاکنون
**hitherward** *adverb*, also hitherwards
لێرە، لەم شوێنە ◌ اینجا
**Hitler** *noun*
Adolf Hitler مرۆی زۆردار (بنەڕەت: لە ناوی (1889-1945) ڕێبەری حیزبی نازی ئوتریشیزادە، سەرۆکی حکومەتی ئەلمانیا 1933-45) ◌ آدم مستبد
**Hitlerism** *noun*
هیتلێریزم ◌ هیتلریسم
**Hitlerite** *noun, adjective*
لایەنگری هیتلێر، هیتلێری ◌ طرفدار هیتلر، هیتلری
**hit list** *noun*
لیستەی بکوژراوان یان قوربانیان (لیستەی ئەو کەسانەی کە دەبێ بکوژرێن یا سزایان لەسەرە و دەبێ جێبەجێ بکرێ) ◌ لیست قربانیان
**hit man** *noun*
پیاوکوژی بەکرێگیراو ◌ قاتل مزدور
**hit or miss** = hit and miss
**hit parade** *noun*
لیستەی پرفرۆشترین ریکۆردە گەلییەکان ◌ لیست پرفروش‌ترین رکوردهای مردمی
**hit squad** *noun*
دەستەی بەکرێگیراو (گرووپێ لە تاوانکاران کە بۆ کوشتنی کەسێ دامەزراون) ◌ هیت‌اسکاد
**Hittite** /ˈhɪtʌɪt/ *adjective, noun*
*adj* سەربە هیتییەکان، ئیمپراتۆری هیتی یان زمانەکەیان *n* 1 ئەندامی گەلێکی کۆن کە ئیمپراتۆرییەکیان لە ئاسیای بچووک و سووریە لە 1700-1200 پێش‌زایین دامەزراند 2 ئەندامی گەلێکی کەنعانی یان سووریەیی باسکراو لە کتێبی پیرۆزدا (سەدەی 11 تا 8ی پێش زایین) 3 زمانی هیتییەکان، کۆنترین زمانی سەلمێنراوی هیند و ئەورووپایی ◌ هیتی
**HIV** /ˌeɪtʃ aɪ ˈviː/ *abbreviation* human immunodeficiency virus
ئێچ‌ئای‌ڤی ◌ اچ‌آی‌وی
**hive** /haɪv/ *noun*
1 کەنوو، خلێف، کوربک، پلوورە 2 مێشەکانی کەنووێ، پوورەهەنگ 3 جێی شلووقایی، شلووقایی، شوێنی جرەبەندان، جێی شلووق و قارەبالغی 4 جرەبەندان، ئاپۆرە ◌ 1 کندو 2 زنبورهای یک کندو 3 جای پرازدحام 4 ازدحام
**hives** /haɪvz/ *noun, pl.*, also urticaria
لیر، لیرگ ◌ کهیر
**HIV-positive** *adjective*
ئێچ‌ئای‌ڤی خوێنی کەسێ ئەرێنییە ◌ اچ‌آی‌وی‌مثبت
**h'm** = hem
**HM** *abbreviation* 1 Her Master 2 His Master
1 خاوەن‌شکۆ (ژن) 2 خاوەن‌شکۆ (پیاو) ◌ 1 علیاحضرت 2 اعلی‌حضرت
**HMG** *abbreviation* Her Majesty's Government
حکومەتی خاوەن‌شکۆ ◌ حکومت علیاحضرت
**HMI** *abbreviation* His *or* Her Majesty's inspector
(لە خوێندنگاکانی بریتانیادا) پشکێنەر ◌ بازرس
**Hmong** /hmɒŋ/ *adjective, noun, pl.* same
*adj* سەربە گەلی همانگ یان زمانەکەیان، همانگی *n* 1 ئەندامێ گەلێ کە لە چیاکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دەژین 2 زمانی ئەو گەلە ◌ همانگ
**HMS** *abbreviation* His or Her Majesty's Ship
کەشتی هێزی دەریایی بریتانیا، کەشتی ئینگلتەرە، کەشتی بریتانیایی ◌ کشتی نیروی دریایی بریتانیا
**HMSO** *abbreviation* His or Her Majesty's Stationary Office
(لە بریتانیا) نووسینگەی فرۆشتنی بڵاونامە حکومییەکان ◌ دفتر فروش نشریات دولتی
**HNC** *abbreviation* High National Certificate
(لە بریتانیا) بڕوانامەی خواربەکالیۆر ◌ گواهی‌نامەی کاردانی
**HND** *abbreviation* High National Diploma
(لە بریتانیا، بەرامبەر بەکالیۆر) بڕوانامەی پیشەیی ◌ گواهی‌نامەی حرفه‌ای
**Ho** symb. the chemical element holmium
**ho** /həʊ/ *interjection*
تە! پیاح! حەح! ◌ اوه!
**hoagie** /ˈhəʊgi/ *noun*
بابۆلەیێ پڕ لە گۆشت، پەنیر و سالات ◌ هوگی
**hoar** /hɔː(r)/ *adjective*
ماش‌وبرنجی، ڕەش‌وسپی، بۆز ◌ جوگندمی
**hoard** /hɔːd, US hɔːrd/ *noun*
پاشکەوتە، پاشەمەند، قەبوور، گەنج، گەنجینە، خەزێنە: *They dug up a hoard of Roman coins* ◌ اندوخته، ذخیره، گنج
**hoarder** *noun*
پاشەکەوتکەر، خۆنەخۆر، ماڵگر، ماڵهەڵگر ◌ اندوخته‌ساز، محتکر
**hoarding**[1] /ˈhɔːdɪŋ, US ˈhɔːrd-/ *noun*
1 گڵدانەوە، هەڵگرتن، پاشەکەوتکردن 2 ماڵگری، ماڵهەڵگری ◌ 1 ذخیره‌سازی 2 احتکار
**hoarding**[2] /ˈhɔːdɪŋ, US ˈhɔːrd-/ *noun*
1 دیوار، ئەردە، پەرژین (کاتی)، دیواری تەختەیی، تەختەبەند: 2 تەختەئاگاداری، تەختەئاگایی، تەختە یان جێگای لێنان یان چەسپاندنی ئاگاداری: *advertising hoardings* ◌ 1 حفاظ، دیوار تخته‌ای 2 محل چسباندن آگهی

**hoarfrost** /'hɔ: frɒst, US 'hɔ:r frɔ:st/ *noun*
سیخوار، زوقم، ئالشت، خازی ◌ بشم

**hoariness** /'hɔ:rinəs/ *noun*
کۆنی، لەباوکەوتوویی ◌ قدمت

**hoarse** /hɔ:s, US hɔ:rs/ *adjective*
1 گـــر، نووســـاو، گــــیراو: *a hoarse cough/cry/scream* 2 (دەنگ) گڕ، گیراو ◌ 1 خشن، زمخت 2 دارای صدای خشن

**hoarsely** /hɔ:sli, US hɔ:rsli/ *adverb*
دەنگ‌نووساوانە، بە دەنگی نووساوەوە ◌ با صدای گرفته

**hoarseness** /hɔ:snəs, US hɔ:rsnəs/ *noun*
نووساوی، گیراوی، گڕی ◌ گرفتگی، زمختی

**hoarstone** /hɔ:stəun/ *noun*
(بریتانیا) بەردی سنووری کۆن ◌ سنگ مرزی قدیمی

**hoary** /'hɔ:ri/ *adjective* (hoarier, hoariest)
1 (قژ) سپی، بۆر، بۆز، ماش‌وبرنجی 2 (بنیادەم) سەرسپی، پیر، بەعومر، بەتەمەن، ئارەفتە، بەسالاچوو 3 لەباوکەوتوو، کۆن، سوو(و)او، *a hoary old joke ◊ hoary legends* :ancient
◌ 1 جوگندمی 2 سالخورده 3 قدیمی

**hoary cress** *noun*, also pepperweed whitetop
(رووەک‌ناسی) قناولە [*Cardaria draba*] ◌ أزمک

**hoatzin** /həu'atsın/ *noun*
هۆئاتزین، هو(ئـ)اتسین: جۆری باڵندەی گەورەی دارنشینی گەرمێنانی ئەمریکا [*Opisthocomus hoazin*] ◌ هواتسین

**hoax** /həuks, US houks/ *noun*
فێڵ، درۆ، تەڵەکە، شۆخی یا گاڵتەی هەڵفریوێنەر، کەڵەک ◌ کلک، دروغ

**hoaxproof** /'həukspru:f/ *adjective*
لەخشتەنەچوو، فریونەدراو، هەڵنەفریواو ◌ فریب‌نخور

**hob** /hɒb, US ha:b/ *noun*
1 دێو، درنج، دێوەزمە، جنۆکە 2 تەنیشت کوانوو یا ئاگردان. پشت یان پشتەوەی کوانوو 3 تاقەی سەرکوانوو یان سەرئاگردان 4 قاڵب ◌ 1 غول، جن 2 بغل اجاق 3 طاقچه‌ی روی اجاق 4 سنبه

**Hobbesian** /'hɒbzıən/ *adjective*
سەربە فیلسووفی سیاسی ئینگلیسی تۆماس هابز Thomas Hobbes (1588-1679) و فەلسەفەکەی ◌ هابزی

**hobbit** *noun*
ئەندامی رەگەزێکی خەیاڵی هاوشێوەی مرۆڤ، گرگن و پێ‌مووداوی، لە چیرۆکەکانی تاڵکین Tolkienدا ◌ هابیت

**hobble** /'hɒbl, US 'ha:bl/ *noun*
1 گیری، شەلی 2 گیروگرفت، گیر 3 پێوەند، زنجیر، کۆستەک، پاشبەند، پاشبێن (ئەسپ، "پێشبەند"یش بۆ بەستنەوەی دەستی‌یەتی) ◌ 1 لنگی 2 گرفتاری 3 بخو، زنجیر

**hobblebush** *noun*
گیادەوەن viburnum ئەمریکای باکووری کە هێشووی گوڵی سپی یان پەمەیی بەردێنێ [*Viburnum alnifolium*] ◌ نوعی گیاه

**hobble skirt** *noun*
داوێنی تەنگ (رێگارۆیشتنی ناخۆش دەکرد، لە ساڵانی 1910 باو بووە) ◌ نوعی دامن

**hobby** /'hɒbi, US 'ha:bi/ *noun*
1 هابی، حەزکاری، سەرقاڵی، سەرگەرمی، کار بۆ خۆشی 2 ئەسپ یان بارگینی چکۆلە ◌ 1 تفنن 2 اسب یا یابوی کوچک

**hobbyhorse** /'hɒbihɔ:s/ *noun*
1 ئەسپی دارین، ئەسپەدارینە 2 بابەتی بەردڵ یا دڵخواز ◌ 1 اسب چوبی 2 موضوع مورد علاقه

**hobbyist** /'hɒbiıst, US 'ha:b-/ *noun*
حەزکار، هابیست ◌ متفنن

**hobgoblin** /hɒb'gɒblın, 'hɒbgɒblın, US 'ha:bga:b-/ *noun*
1 جنۆکە، شەیتان 2 دێو، خێو، درنج، مڵۆزم، دێوەزمە، مێردەزمە ◌ 1 جن، شیطان 2 غول، لولو

**hobnail** /'hɒbneıl/ *noun*
1 بزماری سەرپان، مێخی سەرپان، ناڵچە 2 کەسێ کە کەوشی بزمارڕێژ لەپێ دەکا، دێهاتی، دەشتەکی، لادێیی ◌ 1 میخ پوتین 2 دهاتی

**hobnail boot** *noun*, also hobnailed boot
پۆتینی بزمارڕێژ ◌ پوتین میخ‌دار

**hobnailed** *adjective*
بزمارڕێژ ◌ میخ‌دار

**hobo** /'həubəu, US 'houbou/ *noun, pl.* hoboes or hobos
ئاوارە، دەربەدەر، گەڕاڵ، ماڵ‌بەکۆڵ، بەرەڵا، بەشارانەوە ◌ ولگرد، آواره

**Hobson's choice** /ˌhɒbsnz 'tʃɔıs, US ˌha:b-/ *noun*
تەنیاڕێگاچارە، تەنیا رێگا، هەڵبژاردنی زۆرەملێ یان لە رێی ناچاری‌یەوە، هەڵبژاردنی ناچاری (بنەرەت: لە ناوی Thomas *Hobson*، خانچی ئینگلتەرەیی، مەرگ 1631، مشتەری‌یەکانی ناچار دەکرد تا سواری نزیک‌ترین ئەسپی بەر دەرگا بن) ◌ انتخاب اجباری

**hock**[1] /hɒk, US ha:k/ *noun*
(گیانەوەران) رەفیسکە، رەگەفیسکە، رەمانە، رەفیشک، پێچکە، ئەژنۆی دواوە، وژنگ یان چۆکی پشتەوە ◌ زانوی عقب

**hock**[2] /hɒk, US ha:k/ *noun*
هاک (مەی سپی ئەڵمانیایی؛ بنەرەت: گۆڕاوی ئەڵمانی *Hochheimer (Wein)* "(مەی) هی

"Hochheim) ◌ هاک

**hock**[3] /hɒk, US hɑ:k/ *noun*
بارمتە، گریو ◌ گرو

**hockey** /'hɒki, US 'hɑ:ki/ *noun*
1 چەمکانە، هاکی (جۆرێ کایە کە زۆر شێوەی کاسۆ یان کاشۆ دەدا) 2 (لە ئەمریکا) هاکی سەرسەهۆڵ ◌ 1 هاکی 2 هاکی روی یخ

**hockey stick** *noun*
داری چەمکانە یا هاکی، دارشەقێن ◌ چوب هاکی

**hocus** /'həʊkəs / *noun*
خواردنەوەی دەرمان یان بەنگ‌تێکراو ◌ نوشابەی داروزدە

**hocus-pocus** /ˌhəʊkəs 'pəʊkəs, US ˌhoʊkəs 'poʊkəs/ *noun*
1 ورتەی جادووگەر 2 فێڵ، فریودان، درۆ و کەڵەک 3 چاوبەستی، sleight of hand ◌ 1 ورد 2 نیرنگ، فریب 3 تردستی

**hod** /hɒd, US hɑ:d/ *noun*
قوڕکێش، ناوە (بنەڕەت: لە *hotte* فەڕەنسییەوە "pannier") ◌ ناوە

**hod-carrier** /'hɒd kærɪə(r)/ *noun*
کرێکاری قوڕکێش، ناوەکێش ◌ ناوەکش

**hodden** /'hɒd(ə)n/ *noun*
(زۆرتر لە سکاتلەند) کراسی زبری لەخوری ◌ هودن

**hodgepodge** /'hɒdʒpɒdʒ, US 'hɑ:dʒpɑ:dʒ/ *noun*
چێشتی مجێور، تێکەڵە ◌ شلم‌شوربا

**Hodgkin's disease** /'hɒdʒkɪnz dɪzi:z, US 'hɑ:dʒkɪnz dɪzi:z/ *noun*, also Hodgkin's, Hodgkin's lymphoma
نەخۆشی هاجکین یان هاجکینز: جۆرێ نەخۆشی پرمەترسی شانە لەشاوییەکان lymphatic tissue کە دەبێتە هۆی گەورەبوونەوەی رژێنە لەشاوییەکان lymph node، جگەر و سپڵ (بنەڕەت: لە ناوی پزشکی ئینگلتەرەیی *Hodgkin* Thomas، مەرگ 1866) ◌ امروزی

**hodiernal** /ˌhɒdɪ'ɜ:n(ə)l, US ˌhəʊdɪ-/ *adjective*
(دەگمەن) سەربە رۆژی ئەمڕۆ، ئەمڕۆیی ◌ امروزی

**hodman** /'hɒdmən/ *noun*, *pl.* hodmen
1 کرێکاری قوڕکێش، ناوەکێش 2 نووسەری بەکرێ‌گیراو ◌ 1 ناوەکش 2 نویسندەی مزدور

**hodometer** /həʊ'dɒmɪtə(r)/ *noun*
رێ‌پێو، مەوداپێو ◌ مسافت‌پیما

**hodoscope** /'hɒdəskəʊp/ *noun*
(فیزیک) رێبین(ە) ◌ هودوسکوپ

**hoe** /həʊ, US hoʊ/ *noun*
خاکرن، پاچەکۆڵە، پاچولکە، پێمەڕەی باخەوانی (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ کج‌بیل

**hoecake** *noun*
کەیکی پاچەکۆڵەیی (لە ئاردی گەنمەشامی، لە بنەڕەتدا لەسەر دەمی پاچەکۆلە دەبرژا) ◌ هوکیک

**hog** /hɒg, US hɔ:g, hɑ:g/ *noun*
1 بەرازی دابەستە، بەرازی دەرماڵە (نێر و خەساو) 2 مەڕی نەبڕاوە 3 بنیادەمی چڵێس ◌ 1 خوک پرواری 2 هاگ 3 آدم حریص

**hogback** *noun*, also also hog's back
پشتەبەرازە: زنجیرە چیا یان گردێکی درێژ و لێژ ◌ هاگ‌بک

**hogfish** *noun*, *pl.* same or hogfishes
جۆرێ wrasse ی گەورەی رەنگین زۆرتر لە رۆژاوای ئاتلانتیک پەیدا دەبێ [*Lachnolaimus maximus* و جۆرەکانی تر] ◌ هاگ‌فیش

**hog(ge)rel** *noun*
شەک، مەڕی دووبەهارە یان دووساڵە ◌ گوسفند دوساله

**hogget** /'hɒgɪt/ *noun*
بەرخی یەک‌بەهارە یا یەک‌ساڵە ◌ برەی یک‌ساله

**hoggin** /'hɒgɪn/ *noun*
تێکەڵەیێ لە زیخ و چەو بۆ دارشتنی بنکی رێگا ◌ هوگین

**hoggish** /hɒgɪʃ/ *adjective*
1 چڵێس، نەوسن 2 بەرازڕەفتار، رەفتاربەراز (hoggishly /hɒgɪʃli/ *adv*: بەرازئاسا، بەرازانە؛ hog-like *adj*) ◌ 1 حریص 2 خوک‌منش

**Hogmanay** /'hɒgmənei, US ˌhɑ:gmə'nei/ *noun*
هاگمێنێی، هوگمانای (= جەژنی شەوی ساڵی نوێ ب.ت. لە سکاتلەند) ◌ هوگمانای

**hog-nosed bat** *noun*
شەمشەکوێرەی لووت‌بەرازی: جۆرێکی مێرووخۆر، رەسەنی تایلەند [*Craseonycteris thonglongyai*] ◌ نوعی خفاش

**hognose snake** *noun*
ماری لووت‌بەرازی: جۆرێ ماری لووت‌قیتی بێ‌ژەی رەهۆڵێدەری ئەمریکایی [تۆخم *Heterodon*: چەندین جۆرن] ◌ نوعی مار

**hognut** = earthnut

**hog plum** *noun*
1 دارێکی کاریبیایی بە بەرێکی زەردەوە [*Spondias mombin*] 2 دارێکی ئەمریکایی بەرتاڵ [*Ximenia americana*] ◌ نوعی درخت

**hog's back** = hogback

**hogshead** /'hɒgzhed US 'hɔ:gzhed/ *noun*
1 بەرمیلی گەورە، هاگزهێد، شاکۆس، شابەرمیل، شابۆشکە 2 پێوانەی شلە، بەرامبەر بە 50 گالۆن لە بریتانیا، 62 گالۆن لە ئەمریکا) 3 کووپە ◌ 1 بشکەی بزرگ، هاگزهد 2 هاگزهد 3 خمره

**hogwash** /'hɒgwɒʃ, US 'hɔ:gwɑ:ʃ,

ground 2 focus 1 چەق یا ناوەندی بوومەلەرزە. (hypocentral *adj*) zero ◯ کانون زلزله

**hypochlorite** *noun*
◯ hypochlorous acid خوێ یان ئیسیتری هیپوکلوریت

**hypochlorous acid** /ˌhʌɪpə(ʊ)ˈklɔːrəs/ *noun*
جۆرێ ترشەلۆکی ناجێگیر و لاواز HClO، کاتێ پێکدێ کە کلۆرین لە ناو ئاوی ساردا دەتوێتەوە ◯ اسید هیپوکلوروز

**hypochondria** /ˌhaɪpəˈkɒndriə, US -ˈkɑːn-/ *noun*
1 (لە) نەخۆشیترسی 2 خونەخۆشخستن، خوبەنەخۆشزانی ◯ 1 بیماریهراسی 2 خودبیمارانگاری

**hypochondriac** /ˌhaɪpəˈkɒndriæk, US -ˈkɑːn-/ *noun, adjective*
مرۆی (لە) نەخۆشیترس یا خۆیبەنەخۆش hypochondriacally /ˌhaɪpəˈkɒndriækli, US -ˈkɑːn-/ *adv*) ◯ شخص بیماریهراس

**hypochondriacal** /ˌhaɪpəˌkɒnˈdraɪəkl, US -ˌkɑːnˈd-/ = hypochondriac

**hypochondriasis** /ˌhʌɪpə(ʊ)kɒnˈdrʌɪəsɪs/ = hypochondria

**hypochondrium** *noun, pl.* hypochondria
(توێکاری) کەلەکە، قەبرغە، خالیگە، لاتەڕاف ◯ تهیگاه

**hypochromic anaemia** *noun*
جۆرێ کەمخوێنی کە هێمۆگلۆبین haemoglobin لەنێو خرۆکە سوورەکانی خوێندا (زۆر) کەمە ◯ کمخونی هیپوکرومیک

**hypocorism** *noun*
1 سەرناوی منالانە، ناوی خۆمانە، گچکەناو، 2 بەکارهێنانی ناوی خۆمالی pet name ◯ 1 لقب بچهگانه، اسم تصغیری 2 استعمال اسم خودمانی

**hypocoristic** /ˌhʌɪpə(ʊ)kəˈrɪstɪk/ *adjective*
سەربە یان ئاماژە بە گچکەناو یان سووکەلەناو (hypocoristically *adv*) ◯ وابسته به اسم تصغیری

**hypocotyl** /ˌhʌɪpə(ʊ)ˈkɒtɪl/ *noun*
لاسک یا تەوەری ژێرپەل، تەوەری پەرەسەیی (لە ژێرەوەی cotyledon یان نێوان لاسکەکانی پەل و ریشە و ڕەگی؛ (hypocotylous *adj* ◯ ساقه یا محور زیرلپه

**hypocrisy** /hɪˈpɒkrəsi, US hɪˈpɑːk-/ *noun, pl.* hypocrisies
ریایی، ریاییبازی، ڕوالەت، دووڕوویی، ڕووبینی: *He condemned the hypocrisy of those politicians who do one thing and say another* ◯ ریا، تزویر

**hypocrite** /ˈhɪpəkrɪt/ *noun*
کەسێکی ریاییباز، بنیادەمی دووڕوو، مرۆی ڕوالەتباز: *Charles was a liar and a hypocrite who married her for money* ◯ آدم ریاکار

**hypocritical** /ˌhɪpəˈkrɪtɪkl/ *adjective*
ریاییباز، دووڕوو، ڕووبین، ڕووبینانە، دووڕووانە: *It would be hypocritical of me to have a church wedding when I don't believe in God* ◯ ریاکار، مزورانه

**hypocritically** /ˌhɪpəˈkrɪtɪkli/ *adverb*
ڕووبینانە، دووڕووانە، ریاییبازانە ◯ مزورانه

**hypodermic** /ˌhaɪpəˈdɜːmɪk, US -ˈdɜːrm-/ *adjective, noun*
*adj* ژێرپێستی، بنپێستی، ژێرەوەی پێستی *n* (هەروەها hypodermic needle, hypodermic syringe) دەرزی ژێرپێست، دەرزیلێدانی ژێرپێست (hypodermically *adv*) ◯ *adj* زیرپوستی *n* سرنگ زیرپوست، تزریق زیرپوست

**hypodermic injection** *noun*
دەرزیلێدانی ژێرپێست یان ژێرەوەی پێست ◯ تزریق زیرپوست

**hypodermis** *noun,* also hypoderm
ژێرپێست، بنپێست، پێست یان چەرمی ژێرەوە 1 شانەی (دەسبەجێ) ژێر epidermis ی ڕووەکێ 2 توێی ژێرەوەی خانە epithelial ـەکان (لە جومگەپایان و هێندێ لە بێبڕبڕەکاندا invertebrate، توێژی کیتینی chitinous cuticle دەردەدا؛ (hypodermal *adj* ◯ زیرپوست

**hypodermosis** *noun*
هەنگ ◯ هیپودرموسیس

**hypoeutectoid** *adjective*
خاوەنی کاربۆنی کەمتر لە 0.8 لەسەدی پۆلای eutectoid؛ پێکهێنەری کەمتری تیایە لەچاو ئەوەی لە eutectoid دا هەیە ◯ هیپویوتکتوید

**hypogastrium** /haɪpəˈgæstrɪəm/ *noun, pl.* hypogastria /-rɪə/
ژێرسک، بنزگ، ژێرزگ (hypogastric /haɪpəˈgæstrɪk/ *adj*: ژێرسکی، بنزگی، پێوەندی بە ژێرسکەوە هەیە) ◯ زیرشکم

**hypogeal** /ˌhʌɪpə(ʊ)ˈdʒiːəl/ *adjective,* also hypogean or hypogeous
ژێرعەرزی، بنعەرزی، شینبوو لە ژێرزەوی (بڕوانە epigeal) ◯ زیرزمینی

**hypogene** /ˈhʌɪpə(ʊ)dʒiːn/ *adjective*
ژێرزەوی (لە ژێر زەوی بەرهەم دێ یا ڕوودەدا؛ (hypogenic *adj* ◯ هیپوژن

**hypogenous** *adjective*
لەسەر undersurface دەڕوێ، وەک fingi لەسەر گەلاکان ◯ هیپوژنوس

**hypogeum** /ˌhʌɪpə(ʊ)ˈdʒiːəm/ *noun, pl.* hypogea
ژێرخان، ژێرزەمین ۞ سرداب

**hypoglossal** /haɪpəˈglɑːsl/ *adjective, noun*
*adj* ژێرزمانی، بنزمانی *n* = hypoglossal nerve ۞ زیر زبانی

**hypoglossal nerves** *noun, pl.*
(تویکاری) جووتەدەماری ژێرزمانی یا بنزمانی ۞ عصب‌های زیر زبانی

**hypoglycaemia** /ˌhaɪpəʊglaɪˈsiːmiə, US -poʊg-/ *noun*
(پزشکی) کەمی یان کەمبوون یان دابەزینی شەکری خوێن (hypoglycaemic *adj*) ۞ کمبود قند خونی

**hypognathous** *adjective*
هایپۆگناتوس، شەویلکەی خوارووی لە هی سەرووی گەورەتر یا درێژترە ۞ هیپوگناتوس

**hypogonadism** /ˌhʌɪpə(ʊ)ˈgəʊnadɪz(ə)m/ *noun*
(پزشکی) کەمبوونەوە یان نەمانی دەردانی هۆرمۆن یان چالاکی کارئەندامناسی تری زاوزێ‌رژێنەکان (باتوو و هێلکەدانەکان؛ (hypogonadic *n, adj* ؛hypogonadal *adj* ۞ هیپوگونادیسم

**hypogynous** /hʌɪˈpɒdʒɪnəs/ *adjective*
(رووەکناسی، گیا یان گوڵێ) ژوورنێرکە، سەرنێرکە، نێرەکی stamenیان لەژێر نێرک carpel دا هەڵکەوتووە ۞ هیپوژینوس

**hypogyny** *noun*
ژوورنێرکەیی، سەرنێرکەیی، هەڵکەوتنی نێرەک stamen لەژێر نێرک carpelدا ۞ هیپوژینی

**hypoid** /ˈhʌɪpɔɪd/ *noun,* also hypoid gear
دەندە یان گێرێ کە شێوەی bevel gear دەدا ۞ هیپوئید

**hypokalaemia** /ˌhʌɪpəʊkəˈliːmɪə/ *noun*
کەمی پۆتاسیۆمی خوێن (hypokalaemic *adj*) ۞ کمبود پتاسیم خون

**hypolimnion** /ˌhʌɪpə(ʊ)ˈlɪmnɪən/ *noun, pl.* hypolimnia /-nɪə/
ژێرگۆماوژە: توێی بنەوەی ئاو لە گۆماوێکی چین‌چیندا (لەگەڵ epilimnion بەراورد کرێ؛ hypolimnetic or hypolimnial *adj* ؛hypo- + *limnion* (بنەڕەت: چکۆلێنراوی *limnē* "گۆماو lake") ۞ هیپولیمنیون

**hypomagnesaemia** /ˌhʌɪpə(ʊ)ˌmagnɪˈziːmɪə/ *noun*
کەمی مەنیزیۆمی خوێن ( hypomagnesaemic *adj*: سەربە یان پێوەندی بە کەمی مەنیزیۆمی خوێنەوە هەیە) ۞ کمبود منیزیوم خون

**hypomania** *noun*
شێتۆکەیی، سووکەشێتی، کەمشێتی، نیمچەشێتی (hypomanic *adj*: شێتۆکە، سووکەشێت، کەمشێت، نیمچەشێت) ۞ جنون خفیف

**hyponastic movement** *noun*
جووڵانی ژێرکرژ(ی): چەمانەوەی ئەندامێکی گیایی یان رووەکی بەرەو سەرێ یان خوارێی تەوەری رووەک ۞ حرکت زیرتنجشی

**hyponasty** *noun*
هەڵدانی خێرای بەشی بنەوەی ئەندامێ، ب.ت. هەڵدان و گەشەی خێرای گەڵا، کە دەبێتە هۆی ئەوە بەرەو سەرێ بچەمێتەوە؛ رووانی رووڵەبەرە بە درێژایی روو یان ئاستی خوارووی رووەکێ یا بەشێکی رووەکێ و دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەرەو سەرێ بچەمێتەوە (یان کۆبێتەوە؛ hyponastic *adj*؛ hyponastically *adv*) ۞ زیرتنجی

**hyponitrous acid** *noun*
ترشەڵۆکێکی کریستاڵی ناجێگیر $H_2N_2O_2$ ۞ اسید هیپونیتروز

**hyponym** *noun*
(وشە) ژێرناو: وشەیێ کە ئاماژە دەکا بە پۆلێکی گشتی‌تر (وەک سەندەڵی chair و مێز table ژێروشەی کەلوپەلی ناوماڵن furniture؛ hyponymy ؛hyponymous *adj*؛ بڕوانە superordinate *n*) ۞ معناشمول (واژه)

**hypoparathyroidism** /ˌhʌɪpəʊˌparəˈθʌɪrɔɪdɪz(ə)m/ *noun*
(پزشکی) کەمپاراتیرۆئیدی، کەمی هۆرمۆنی پاراتیرۆئید لە خوێندا ( hypoparathyroid *adj*) ۞ هیپوپاراتیروئیدیسم

**hypopharynx** *noun*
ژێرگەروو، بنقورگ، ژێرقورگ، ئەندامی ژێرقورگی، ئەندام یان زیادەی زمانی (لە زۆر مێرووودا و بە شێوەی زمان)؛ بەشی قوڕقوڕاگەیی گەروو، لە hyoid bone دەس پێ‌دەکا تا لێواری خوارووی کرۆژەی laryngeal cricoid ۞ زیرحلق

**hypophosphate** *noun*
خوێی ترشەڵۆکی هایپۆفۆسفۆریک ۞ هیپوفسفات

**hypophosphite** *noun*
خوێی ترشەڵۆکی هایپۆفۆسفۆرۆس ۞ هیپوفسفیت

**hypophosphoric acid** *noun*
ترشەڵۆکی هایپۆفۆسفۆریک، جۆرێ ترشەڵۆکی ناجێگیر $H_4P_2O_6$، تەنیا خوێ‌یەکەی هەیە ۞ اسید هیپوفسفریک

**hypophosphorous acid** *noun*
ترشەڵۆکی هایپۆفۆسفۆرۆس، جۆرێ ترشەڵۆکی کریستاڵی و بەهێز $H_3P_2O_2$ ۞ اسید هیپوفسفروز

**hypophysectomy** *noun, pl.* hypophysectomies
بڕین یان دەرکێشانی pituitary gland ۞ هیپوفیزکتومی

**hypophysis** /haɪˈpɒfɪsɪs/ *noun, pl.* hypophyses /-siːz/

(تویکاری) ژێرمێشکەڕژێن ( hypophyseal or hypophysial *adj*: سەربە ژێرمێشکەڕژێن، وشەیێکی تکنیکی بۆ pituitary) ◌ غدەی هیپوفیز

**hypopituitarism** /ˌhʌɪpəʊpɪˈtjuːɪt(ə)rɪz(ə)m/ *noun*

(پزشکی) کەمکاری رژێنەی pituitary، ب.ت. لە پلی پێشەوە anterior lobe؛ کەمبەرهەمهێنان یان کەمدەردرانی هۆرمۆنەکانی هەڵدان growth hormones لە لایەن ژێرمێشکەڕژێنەوە (ئەنجامەکەی کورتەبالایی و زووپێگەیشتنە، hypopituitary *adj*) ◌ هیپوپیتوایتاریسم

**hypoplasia** *noun*, also hypoplasty

(پزشکی) کەمهەڵدان، کەمی نائاسایی خانەکان و توخمە پێکهاتەییەکان؛ هەڵنەدان یان هەڵدانی ناتەواوی شانە یان ئەندامێ، بە شێوەیێ کە ئەو ئەندامە یان شانەیە لەباری ئەندازە و پێگەیشتنەوە خوارتر لە رادەی ئاساییە (hypoplastic *adj*) ◌ هیپوپلازیا

**hypoploid** *adjective, noun*

خاوەنی ژمارەیێ کرۆمۆزۆمێ کە لە ژمارەی دیپلۆئید کەمترە؛ خانە یان زیندەوەرێ کە ژمارەی کرۆمۆزۆمەکانی لەگەڵ ژمارەی دیپلۆئید کەمترە یان یەکتر ناگرنەوە (hypoploidy *n*) ◌ هیپوپلوئید

**hyporachis** *noun*

پەڕچە، پەڕۆچکە، پەڕێکی چکۆلە کە لە بەشی پشتەوەی هێندێ لە پەڕی باڵندەکان دەردێ یان دەڕوێ ◌ زیرساقەی پر

**hyposensitization** *noun*

کەمهەستیاری، کەمبوونەوەی رادەی هەستیاری سەبارەت بە مادەیێ کە کاردانەوەی ئالێرژیکی هەیە، desensitization ◌ هیپوستیزاسیون

**hypospadias** /ˌhʌɪpəʊˈspeɪdɪəs/ *noun*

(پزشکی) دۆخ یان کێشەیێکی زگماکی نێرینە کە لەودا کونی مێزەڕۆ urethra لە لایێکی سیرەتەوەیە (بنەڕەت: لە *hupospadias* یونانی "کەسێ کە وایە") ◌ هیپواسپادیاس

**hypostasis** /haɪˈpɒstəsɪs/ *noun, pl.* hypostases /-siːz/

1 وادانان، بنەما، بنەڕەت، گەوهەر، کرۆک 2 (پزشکی) خوێن تێزان 3 (یەزدانناسی) هەریەک لە سێ کەسی تەرێنیتی ( hypostatic /ˌhʌɪpə(ʊ)ˈstatɪk/ or hypostatical *adj*: 1 بنچینەیی، گەوهەری، بنەڕەتی 2 سەربە کەسانی تەرێنیتی؛ hypostatically *adv*) ◌ 1 فرض، اساس، ذات 2 تراکم خون 3 هیپوستاز، هیپوستاسیس، اقنوم

**hypostatization** *noun*

راستیپێدان، جووڵانەوە یان دانان (چەمکێ وەک راستییێکی کۆنکرێت یان بوونێکی راستەقینە ◌ واقعیتبخشی

**hypostome** *noun*

ژێردەم: چەند پێکهاتەیێکی دەمی وەک 1 دەسک(ـە) manubrium ی hydrozoan ی 2 ئەندامێکی میلەئاسای rodlike ژێر دەنووکی هێندێ مۆریان یان گەنە ◌ هیپواستوم

**hypostyle** /ˈhʌɪpə(ʊ)stʌɪl/ *adjective, noun*

*adj* خاوەن میچێ کە بە کۆڵەکە راگیراوە، کۆڵەکەڕێز *n* خانووبەرەیێ بە میچێکی واوە ◌ *adj* دارای سقف مبتنی بر ردیف ستون *n* ساختمانی با چنین سقفی

**hyposulphite** *noun*, US hyposulfite

1 (هەروەها hydrosulphite خوێی sodium = 2 hyposulfurous acid thiosulfate (لە وێنەگریدا وەک fixer) ◌ هیپوسولفیت

**hyposulphurous acid** *noun*

ترشەڵۆکی هایپۆسۆلفۆرۆس $H_2S_2O_4$ ◌ اسید هیپوسولفروز

**hypotaxis** *noun*

پێکەوەبەستنی بڕگە یان فرێزەکان لە پێوەندییێکی subordinate دا، بە بەکارهێنانی پیتی پێوەندی یا لێکدەر (hypotactic *adj*) ◌ هیپوتاکسیس

**hypotension** *noun*

(پزشکی) 1 لەخواریبوونی نائاسایی پەستانی خوێن، گوشار یان پەستانی خوێنی کەم، کەمپەستان (ی خوێن) 2 نەخۆشی ئەم کۆنیشانەیە (hypotensive *adj*) ◌ کمفشار

**hypotenuse** /haɪˈpɒtənjuːz, US -ˈpɑːtənuːs, -njuːz/ *noun*

(سێگۆشەی گۆشەڕێک) ژێ ◌ وتر

**hypoth.** = 1 hypothesis 2 hypothetical

**hypothalamus** /ˌhʌɪpə(ʊ)ˈθaləməs/ *noun, pl.* hypothalami /-mʌɪ/

(تویکاری) هایپۆتالاموس (لەژێر تالاموس کە دەسبەسەر تێمپراچێری لەش، برسێتی و تونیەتیدا دەگرێ؛ hypothalamic *adj*) ◌ هیپوتالاموس

**hypothec** /haɪˈpɑːθɪk/ *noun*

بارمتە (hypothecary /haɪˈpɒθəkrɪ/ *adj*: بارمتەیی) ◌ رهن

**hypothecation** /haɪˌpɑːθəˈkeɪʃn/ *noun*

بارمتەدانان (hypothecator *n*: بارمتەدانەر؛ بنەڕەت: لە -hypothecare ,hypothecat *لاتینی* سەدەکانی نێوەڕاست "دان یان سپاردن وەکوو گرێو یان بارمتە"، لەسەر بنەمای hupothēkē یونانی "سپاردە یان ئەسپاردە deposit") ◌ رهنگذاری

**hypothenuse** = hypotenuse

**hypothermal** *adjective*
1 (لەمەڕ نیشتووە کانییەکانەوە) پێکهاتوو لە قـولایی و تیمپراچنیزیکی زۆر (بـالا) 2 - tepid ,lukewarm ◌ هیوترمال
**hypothermia** /ˌhaɪpəˈθɜːmiə, US -ˈθɜːrm-/ *noun*
(پزشکی) هیوتیرمیا، کـەمگـەرمـایی: هاتنەخوارەوەی ناناسایی گەرمی لەش: *Elderly people may die of hypothermia if they cannot afford to heat their homes* (hypothermic *adj*) ◌ هیوترمیا
**hypothesis** /haɪˈpɒθəsɪs, US -ˈpɑːθ-/ *noun, pl.* hypotheses /-siːz/
وادانان، گریمانە: *to formulate/confirm a hypothesis* ◊ *a hypothesis about the function of dreams* ◊ *There is little evidence to support these hypotheses* (hypothesist *n*؛ بنـەڕەت: لـە *hupothesis* یونانی "foundation") ◌ فرضیه، فرض، پندار
**hypothetical** /ˌhaɪpəˈθetɪkl/ *adjective*, also hypothetic
وادانەرانـە، گریمانـەیی، گریمانـەکی، لەسـەر بنچینـەی وادانـان، سـەربە وادانـان، وادانـراو: *a hypothetical question/situation/example* ◊ *I wasn't asking about anybody in particular—it was a purely hypothetical question* (hypothetically /ˌhaɪpəˈθetɪkli/ *adv*: بە شێوەیەکی گریمانەیی، وادانەرانە) ◌ فرضی
**hypothyroisism** /ˌhʌɪpəʊˈθʌɪrɔɪdɪz(ə)m/ *noun*
(پزشـکی) کـەمکـاری یـان کـەمچـالاکی (بـە شێوەیێکی ناناسایی) رژێنەی تیرۆئید، دەبێتـە هۆی دواکەوتنی هەڵدان و پەرەسەندنی هۆشـی یـان مێـشکی growth and mental development (hypothyroid *n, adj*) ◌ هیوتیروئیدیسم
**hypotonic** /ˌhʌɪpə(ʊ)ˈtɒnɪk/ *adjective*
کەمکرژ، کەمڕاکێش(ان)، هایپۆتۆنیک 1 خاوەنی کـەمتـر لـە تـۆن یـان ڕاکێـشانی ئاسـایی (وەک ماسوولکەیێ) 2 کەمپەستان، سـەربە گـیراوەیێ بە پەستانی دەڵێنەرانە یان دادەرانەی osmotic pressure کەمترەوە لەچاو شلەیێکی تایبەتی: *hypotonic organisms* (hypotonia *n*؛ hypotonicity *n*) ◌ هیپوتونیک، کمفشار
**hypotrichous** *adjective*
کەمموو، بێموو، کەمی موو لە لەشدا ◌ کمتار
**hypotrophy** *noun*
(زیندەناسـی) هەڵـدان یـان گەشـەی کـەمترلـە (ڕادەی) ئاسایی ◌ رشد کمتر از معمول
**hypoxaemia** /ˌhʌɪpɒkˈsiːmɪə/ *noun*, US hypoxemia
(پزشکی) چڕیێکی نزمی ناناسایی ئۆکسیژێن لە خوێندا (hypoxaemic *adj*) ◌ هیپوکسیمیا
**hypoxanthine** *noun*
هایپۆگزانتین، هیپۆگزانتین: جۆرێ بازی پیورین $C_5H_4N_4O$ purine base کـە لـە شـانەی گیانـەوەران و گیـا و ڕووەکدا دۆزراوەتـەوە ◌ هیپوگزانتین
**hypoxia** /hʌɪˈpɒksɪə/ *noun*
کەمی ئۆکسیژێن لە شانەکانی لەشدا (hypoxic *adj*؛ بنەڕەت: لە -hypo + oxygen + -ia[1]) ◌ کمبود اکسیژن در بافت‌های بدن
**hypsilophodont** /ˌhɪpsɪˈlɒfədɒnt/ *noun*
هیپسیلۆفۆدۆنت: جۆرێ دایناسۆری جووتپێی چکۆلـەی تیـژڕەو (بنـەڕەت: لـە لاتـینی نـوێ *Hypsilophodontidae* (نـاوی خێـزان)، لـە یونانی *hupsilophos* "پۆپەبەرز، تاجبەرز -high crested" + *odont- odous* "ددان tooth") ◌ هیپسیلوفودونت
**hyps(o)-** *prefix*
پێشگر: بـەرزایی، بڵێندایی، height ,altitude (بنـەڕەت: لە *hupsos* یونانییەوە *hypsometer* "heigh") ◌ پیشوند: ارتفاع، فراز
**hypsography** /hɪpˈsɒgrəfi/ *noun*
بەرزاییگرافی، هیپـسۆگرافی (زانـستێ کە باسی بـەرزاییـەکانی سـەرعەرز دەکـا؛ hypsographic(al) *adj*؛ hypsographically *adv*) ◌ هیپسوگرافی
**hypsometer** /hɪpˈsɒmɪtə/ *noun*
بەرزاییپێو، بڵێندایی‌پێو (hypsometric *adj*؛ hypsometry /hɪpˈsɒmətri/ *n*: بەرزاییپێوی، بڵێندایی‌پێوی) ◌ ارتفاع‌سنج
**hyracotherium** /ˌhʌɪrəkə(ʊ)ˈθɪərɪəm/ *noun*
هـایراکۆتیریۆم، هیراکۆتۆریـۆم: سـەرەتاترین بووبەرد fossilی ڕەگەزی ئەسپ، گیانەوەرێکی دارستانی چکۆلەی سەردەمی Eocene بە چوار قامـک لـە پێـشەوە و سـێان لـە پاشـەوە ◌ هیراکوتریوم
**Hyrcanian** *adjective, noun*
هیرکانیـایی، سـەربـە هیرکانیـا (سـتانێکی ئیمپراتۆری ئێرانی کۆن، لە کەناری باشووری ڕۆژهەڵاتی دەریای کاسپیەن Caspian Sea و باکووری ڕۆژهەڵاتی میدیا و باکووری ڕۆژاوای پارتیا) ◌ هیرکانیایی
**hyrax** /ˈhʌɪraks/ *noun, pl.* hyraxes or hyraces, also dassie
گیاوەرێکی گیاخۆری کلککورتی چکۆلە، هی ئـەفریکا و عـەرەبیا (شـامات [خێـزان Procaviidae: چـەنـدین جـۆرن]؛ بنـەڕەت: لاتـینی نـوێ، لـە *hurax* یونـانی "-shrew

mouse") ◌ هیراکس

**hyssop** /ˈhɪsəp/ *noun*

1 (رووەکناسی) زووفا، زۆفا، پیرەژنە (= گیایێکی بۆنخۆشی چکۆلە لە تیرەی مەزرە mint، کە لاکانی بۆ چێشت یان دەرمان بەکاردێنرا [*Hyssopus officinalis*]) 2 (لە کتێبی پیرۆزدا) دەوەنە کێوییێ کە لە نەریت و ڕێ‌ڕەسمی کۆنی جوولەکەدا وەک بخووری پیرۆز بەکاردێنرا (بنەڕەت: *hysope* ئینگلیسی کۆن، بە ڕێگای لاتین لە *hyssōpos* یۆنانی، بنەڕەت سامی) ◌ 1 زوفا 2 هیسوپ

**hyster(o)-** *prefix*

پێشگر: هیستری، منالدان، منداڵدان: *hysterectomy* (بنەڕەت: لە *hustera* یۆنانییەوە "womb") ◌ پیشوند: هیستری، رحم، زهدان

**hysterectomy** /ˌhɪstəˈrektəmi/ *noun, pl.* hysterectomies

منالدان‌دەرهێنان، هەڵکێشانی منالدان، منالدان‌بڕی: *She had to have a hysterectomy* ◌ رحم‌برداری

**hysteresis** /ˌhɪstəˈriːsɪs/ *noun, pl.* hystereses

دواکەوت: پاش‌کەوتنی کاریگەری کۆمەڵە هۆکار یان هێزێ کاتێ کە ئەم هۆکارانە (هێزانە) لە لەش‌دا گۆڕانیان بەسەر هاتووە (ب.ن. بەهۆی گۆڕانی خەستی ماک و مادەی نێو لەش یان بەهۆی (لیک)خشانی نێوەکییەوە internal friction؛ hysteretic *adj*) ◌ هیسترزیس

**hysteria** /hɪˈstɪəriə, US -ˈstɪr-/ *noun*

1 پرکام، شاگەشکە، شێت‌گیری: *There was mass hysteria when the band came on* ◊ *A note of hysteria crept into her voice* 2 هەڵس‌وکەوت، ڕەفتار 3 ورووژان 4 پێکەنین، سۆز و قیژەی کۆنترۆڵنەکراو و شێتانە، فێ، گەشکە ◌ 1 هیستری 2 رفتار 3 هیجان 4 خنده، عاطفه و داد غیرقابل کنترل و جنون‌آمیز

**hysterical** /hɪˈsterɪkl/ *adjective*

1 پرکامی، لە ئەنجامی پرکام 2 شێتانە، ورووژاو. (نافەرمی، زۆر) پێکەنینی، گاڵتەجار، زانێکەر، *She seemed to find my situation absolutely hilarious* ◊ *a hysterical movie* ◌ 1 *This book is hysterical* ◊ *hysterical* هیستریایی 2 دیوانەوار، هیجان‌زده، مضحک

**hysterically** /hɪˈsterɪkli/ *adverb*

شێتانە، بە شێوەیەکی پێکەنینی، پێکەنینیانە: *laugh/cry/scream/sob hysterically* ◊ *hysterically funny* ◌ دیوانەوار، به طور مضحک

**hysterics** /hɪˈsterɪks/ *noun, pl.*

1 لێهاتنی پرکام، لێهاتن یان هێرشی هیستریا 2 پێکەنینی شێتانە و کۆنترۆڵنەکراو، پیران، گەشکە(لێهاتن)، پێکەنینی خۆبێ‌ڕانەگیراو، خەش 3 پرمە ◌ 1 حملەی هیستریا 2 خندەی کنترل‌ناپذیر 3 حملەی گریه

**hysteritis** *noun*

(هەڵ)ئاوسانی منالدان ◌ ورم رحم

**hysterogenic** *adjective*

دەبێتە هۆی فێ یان پرکام، مایەی هێرش یان لێهاتنی هیستریا (hysterogeny *n*) ◌ موجب تشنج، حمله‌آور، تشنج‌آور

**hysteroid** *adjective*

پرکام‌ئاسا، شێوەپرکام، فێ‌ئاسا، شێوەفێ؟، هیستریائاسا، شێوەهیستری ◌ هیستری‌مانند، تشنج‌مانند

**hysterology** *noun*

منالدان‌ناسی (زانستێ کە باسی منالدان دەکا) ◌ رحم‌شناسی

**hysteron proteron** /ˌhɪstərɒn ˈprɒtərɒn/ *noun*

(ڕەوانبێژی) هەڵگەڕانەوە (لە پێشەوەهاتنی ئەنجام بەرلە پێشەکی؛ بنەڕەت: لە Late Latin ـەوە، لە *husteron proteron* یۆنانی "پاش‌تر (دانان لە شوێنی) پێش‌تر") ◌ قلب

**hysterotomy** *noun, pl.* hysterotomies

منالدان‌بڕی، بڕینی منالدان، وەک لە Caesarcanدا ◌ جراحی رحم

**Hystricomorpha** /ˌhɪstrɪkə(ʊ)ˈmɔːfə/ *noun, pl.* hysterotomies, pl.

(گیانەوەرناسی) سووچەڕشێوەکان، سووچەڕییەکان، شێوەسووچەڕەکان: بەشێکی division بەربڵاو لە کرتێنەران rodent، زۆرتر هی ئەمریکای باشوورین، بەرازە هیندییەکان guinea pig، کوێپو coypu و سووچەڕ یان ژیشکەکان دەگرێتەوە ( hystricomorph *n, adj*؛ بنەڕەت: لاتینی نوێ، لە *hystric- hystrix* لاتین "سووچەڕ porcupine" + *morphē* یۆنانی "شێوە") ◌ هیستریکومورفا

**Hz** *abbreviation* hertz

هێرتز، هێرتس ◌ هرتز

# I i

**I¹, i** /aɪ, *pl.* Is, I's, i's /aɪz/ *noun*
1 ئای (= نویەمین پیتی ئەلفوبێی ئینگلیسی) 2 (لە ژمارەنووسی رۆمیدا) یەک 3 نویەمین پلە، نۆهەمین نمرە (هی کۆمەڵە شت یان بابەتێ) 4 شتێک لە شێوەی پیتی I ۞ 1 آی 2 یک (در عددنویسی رومی) 3 نهمین درجه 4 چیزی به شکل حرف I

**I²** *pronoun*
من، ئەز (= جێناوی کارای یەکەم کەسی تاک) ۞ من

**I³** *abbreviation* 1 Island(s); Isl(e) (chiefly on maps) 2 symb. the chemical element iodine 3 symb. electric current

**-i¹** *suffix*
پاشگر: ئاوەڵناو لە ناوی شوێن لە رۆژهەلاتی نزیک و نێوەڕاست ساز دەکا: *Azerbaijani* ۞ پسوند: صفت‌ساز

**-i²** *suffix*
پاشگر: (ناوی کۆ ساز دەکا) 1 ئەو ناوانەی کە لە لاتینەوە وەرگیراون و بە -*us* کۆتاییان هەیە: *foci* 2 ئەو ناوانەی کە لە ئیتالیاییەوە وەرگیراون و بە -*e* یان -*o* کۆتاییان هەیە: *dilettanti* ۞ پسوند: اسامی جمع را می‌سازد

**-i-** *suffix*
پاشگر: بزوێنێکی بەستەر یان پێوەندیدەرە کە زۆرتر ئەو وشانە ساز دەکا کە کۆتاییان بە -*ana*، -*ferous*، -*fic*، -*form*، -*fy*، -*gerous*، -*vorous* هاتووە ۞ پسوند: نوعی واکه‌ی پیوندی

**-ia¹** *suffix*
پاشگر: 1 لەو وشانەی کە لە یۆنانی و لاتینەوە وەرگیراون، ناو دروست دەکا (وەک *mania*)، و زاراوە تازەکانی لاتین (وەک *utopia*) 2 ناوی شوێن ساز دەکا (وەک *India*) 3 ناوەکان ساز دەکا وەک: (پزشکی) دۆخ و نارەحەتی، تێکچوون، نەخۆشی: *anaemia*، *hysteria* (رووەکناسی و گیانەوەرناسی) تۆخمی رووەکەکان و گیانەوەرەکان: *Fuchsia* ۞ پسوند: اسم‌ساز

**-ia²** *suffix*
پاشگر: ناوی کۆ ساز دەکا: 1 (گیانەوەرناسی) لە ناوی پۆلەکاندا: *Reptilia* 2 لەو ناوە نەنێرنەمێیانە یان بێلایەنانەی یۆنانی کە بە -*ion* یان هی لاتینی کە بە -*ium* یان -*e* کۆتاییان پێهاتووە، ناوی کۆ دروست دەکا: *paraphernalia* ۞ پسوند: اسم‌ساز

**-ial** = -al (forming adjectives such as *celestial*)

**iamb** /'aɪæm, US 'aɪæmb/ *noun,* also iambus
ئایام: یەکەی رەوتێ لە هەڵبەستدا، بەدوای یەکهاتنی برگەیەکی بێزەبر و برگەیەکی زەبردار یان درێژ لە هەڵبەستی ئینگلیسیدا ۞ ایامب

**iambic** /aɪ'æmbɪk/ *adjective, noun*
*adj* سەربە ئایام، ئایامبیک، ئیامبیک *n* (iambics) هەڵبەستێ کە بەو شێوەیە بێ ۞ *adj* وابسته به ایامب، یامبوسی *n* ایامبیکس

**iambic pentameter** *noun*
ئایام پێنتامیتر (= نموونەیەکی باوی هەڵبەستی ئینگلیسی، کە لەودا هەر دێڕە هەڵبەستێ پێنج ئایامی تیایە) ۞ ایامب پنتامتر

**iambus** /aɪ'æmbəs/, *pl.* iambuses or iambi /-baɪ/ = iamb

**-ian** *suffix*
پاشگر: ـیی، ـ یایی، ـئێتی، پسپۆڕی، شارەزای (optician، بنەڕەت: لە *-ien* فەرەنسی یان *-ianus* لاتینەوە) ◌ پیشوند: ـی، ـیایی، متخصص
**-iana (also -ana)** *suffix*
پاشگر: (ناوی کۆ ساز دەکا) کۆمەڵ یان گرووپێ لە راستییەکان، بابەتەکان، چیرۆکەکان و هتد، ئامازە بەو شتانەی کە پێوەندی بە کەس، شوێن یان مەڵبەندیکی چالاکییەوە هەیە: *Victoriana* ◌ پسوند: مجموعه یا گروهی از واقعیات، موضوعات، داستان‌ها و الخ
**-iasis** = -asis
**-iatric** *suffix*
پاشگر: سەربە چارەسەر(کردن)ی پزشکی: *pediatric* ◌ پسوند: وابسته به معالجه‌ی پزشکی
**iatric** /ɪaˈætrɪk/ *noun*, also iatrical
(سەربە) پزشکی: *pediatric* ◌ طبی، وابسته به پزشکی
**-iatrical** *suffix*
پاشگر: سەربە چارەسەر(کردن)ی پزشکی، پێوەندی بە چارەسەری پزشکییەوە هەیە ◌ پسوند: وابسته به معالجه‌ی پزشکی
**-iatrics** *suffix*
پاشگر: سارێژبوونەوە، چابوونەوە یان چارەسەر (کردن)ی پزشکی ◌ پسوند: بهبود یا معالجه‌ی پزشکی
**iatro-** /aɪˈatrəʊ/ *prefix*
پێشگر: سەربە چارەسەری یان دەرمانی پزشکی: *iatrogenic* (بنەڕەت: لە *iatros* "پزشک" یونانییەوە، لە *iasthai* "چاکردنەوە، سارێژکردنەوە") ◌ پیشوند: وابسته به معالجه‌ی پزشکی
**iatrochemistry** *noun*
کیمیای پزشکی ◌ شیمی پزشکی
**iatrogenic** /ʌɪˌatrə(ʊ)ˈdʒɛnɪk/ *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە نەخۆشییێکەوە هەیە کە بەهۆی چارەسەری پزشکییەوە تووش بووبێ <iatrogenic symptoms> <an iatrogenic rash> iatrogenesis *n*) ئایاترۆژێنیسیس، ئیاترۆژ(ێـ)نیز) ◌ ایاتروژنیک
**iatrogenically** /ʌɪˌatrə(ʊ)ˈdʒɛnɪkli/ *adverb*
بە شێوەیێکی یان لەباری ئایاترۆژێنیک(ـەوە) ◌ از لحاظ ایاتروژنیک
**iatrology** *noun*
1 زانستی پزشکی، زانستی چارەسەری یان دەرمان، پزشکیناسی 2 نامیلکەی پزشکی ◌ 1 علم پزشکی 2 رساله‌ی پزشکی
**-iatry** *combining form*
پێشگر: تیمار یان چارەسەری پزشکی، دەرمانی پزشکی، سارێژبوونەوە، چا(ک)بوونەوە: *podiatry*، *psychiatry* (بنەڕەت: لە *-iatrie* فەرەنسی، لە *-iatria* لاتینی نوێ، لە *iatreia* یونانی "هونەری سارێژکردنەوە یان چاکردنەوە"، لە *iatros* "healer"، لە *iasthai* "to heal"، چا(ک)کردنەوە، سارێژکردنەوە") ◌ پسوند: معالجه‌ی طبی، بهبودی
**ib.** = ibid
**IBA** *abbreviation* Independent Broadcasting Authority
ئایبیئەی ئایبیئێی (= دەزگایەکی چاودێر بەسەر رادیۆ و تەلەفزیۆنی بریتانیا، بێجگەلە بیبیسی) ◌ آی‌بی‌ای
**Iban** /ˈiːban/ *noun, pl.* same
1 ئیبان: ئەندامی گەلێکی رەسەنی کالیمانتان Kalimantan یان ساراواک Sarawak Sea Dayan 2 زمانی ئەوسترۆنیزیایی Austronesian ئەو گەلە ◌ ایبان
**I-beam** *noun*
کاریتە یان دەستەکی لە ئاسن، تەزاسن، تەژئاسن (بڕگەی پانایییەکەی بە شێوەی I) ◌ تیرآهن
**Iberian** /aɪˈbɪəriən, US -ˈbɪr-/ *adjective, noun*
*adj* ئیبێریایی (سەربە سپانیا یان پۆرتوگال یان خەڵکەکەیان) *n* 1 دانیشتووی رەسەنی ئیبێریا ب.ت. لە سەردەمانی کۆندا 2 زمانی تیاچووی رۆمی لە کۆمەڵە دورگەی ئیبێریایی لە سەردەمانی کلاسیکدا 3 زمانی نەماوی سێلتی کە لە کۆمەڵە دورگەی ئیبێریایی لە سەردەمانی کۆندا قسەی پێدەکرا ◌ ایبریایی
**iberis** /ʌɪˈbɪərɪs/ *noun, pl.* same
(رووەکناسی) گیایێ تیرەیێ کە candytuft ـەکان دەگرێتەخۆ [تۆخم *Iberis*] ◌ نوعی گیاه
**ibex** /ˈaɪbeks/ *noun, pl.* ibexes
بزنەکێوی (بە شاخی چەماو و درێژەوە [ *Capra ibex* (ئوراسیا و باکووری خۆرهەلاتی ئەفریکا) و *C. pyrenaica* (هی چیاکانی پیرنیە)]) ◌ بز کوهی
**IBF** *abbreviation* International Boxing Federation
فیدراسیۆنی بۆکس(ینگ)ی نێونەتەوەیی یان جیهانی ◌ آی‌بی‌اف
**Ibibio** /ˌɪbɪˈbiːəʊ/ *noun, pl.* same or Ibibios
1 ئەندامی گەلێکی باشووری نایجیریە 2 زمانی Benue-Congoی ئەو گەلە ◌ ایبیبیو
**ibid.** /ˈɪbɪd/ *adverb*, also ib.
(وەختێ کە باسی سەرچاوەکان دەکرێ، ب.ت. لە ژێرەوەی کتێبدا) لەوێ، هەرلەوێ، هەر لەو سەرچاوە، لە هەمان جێ (بنەڕەت: کورتەی *ibidem* "هەر لەوێ") ◌ همان‌جا
**-ibility** = -ability
**ibis** /ˈaɪbɪs/ *noun, pl.* ibises

ئـایبیس، لەکلـەکی گـەرمێن: مـل و لاق و دەنووکدرێژ و کەمێ کوور، نزیک بە ناو لە ناوچـە گەرمێنـەکاندا دەژێ [*Threskiornis*، *Plegadis* و توخمەکانی تر: گەلێ جۆرن] ◌ نوعی لکلک، آیبیس

**Ibizan** /ɪˈbiːθən/ *noun, adjective*

*n* خەڵکی Ibiza دوورگەکانی Balearic ئەوپەڕی ڕۆژاوا *adj* سەربە ئیبیزا، ئیبیزایی ◌ ایبیزایی

**Ibizan hound** *noun*

تاجی ئیبیزیایی ◌ سگ شکاری ایبیزایی

**-ible** = -able

**-ibly** = -ably

**IBM** *abbreviation* International Business Machines

ئای‌بی‌ئێم (گەورە کۆمپانیای کامپیوتێر): *an IBM-compatible machine* ◌ آی‌بی‌ام

**Ibo** /ˈiːbəʊ/ = Igbo

**ibogaine** /ɪˈbəʊɡəˌiːn/ *noun*

دەرمانێکی هالوسینۆژێنیک لە ڕەگی دەوەنێکی ئەفریکای باکووری، جاروبار بۆ چارەی گیرۆدە بە هێرۆئین و کۆکائین ◌ ایبوگاین

**ibuprofen** /ˌaɪbjuːˈprəʊfen, US -ˈproʊ-/ *noun*

ئیبـوپرۆفێن، ئـایبوپرۆفێن (= دەرمانـێ بـۆ داشکاندنی ژان، سووتانەوە و تا) ◌ ایبوپروفن

**i/c** *abbreviation* in charge of

بەرپرسی، لێپرساوی ◌ مسؤل

**IC** *abbreviation* integrated circuit

**-ic** *suffix*

پاشگر: ـی، سەربە، ـەکی، ـی...، ـی‌یانە، پێوەندەی بە... هەیە، بەستراوە بە، وەرگیراو یان بەرهەم‌هاتوو لە، یان خاوەنی، ـ تیایە، وەکوو، شێوە‌ـ شوێن‌کەوتوو، دواکەوتە، لایەنگر، ئالیگر، ـهێنەر، ـهێن، ـێنەر؛ *terrific Islamic*؛ ناوەکان دروست دەکـا وەک *mechanic lyric* (کیمیا) ئاماژە بە توخمێ کە هاوهێزی‌یێکی valency سەرتری هەیە، خاوەنی هاوهێزی‌یێ کە لەچاو ئـەو ناوێتانـە یـان ئایۆنانـە کـە بـە پاشـگری ئاوەڵناوسازی *-ous* کۆتایی‌یان هاتووە، سەرترە: *ferric iron* (بنەڕەت: لە *-ique* فەرەنسی، *-icus* لاتین یان *-ikos* یۆنانی‌یەوە) ◌ پسوند: وابسته به، مربوط به، مشتق از، دارای، محتوی، شبیه به، پیرو، طرفدار، آور؛ (شیمی) ایک

**-ical** = -ic

**-ically** *suffix*

پاشگر: ئاوەڵکار دروست دەکا ◌ پسوند: قیدساز

**Icarian** *adjective*

1 سەربە ئیکارۆس 2 بەرزەفڕ ◌ 1 وابسته به ایکاروس 2 بلندپرواز

**Icarus** *noun*. Latin, from Greek *Ikaros*

ئیکارۆس: کوڕی Daedalus کە بۆ دەربازبوون لە زیندان بە باڵە دەسکردەی هەڵدەفڕێ و کاتێ زۆر لـە خـۆر نزیـک دەبێتـەوە مێوی باڵـەکانی دەتوێتەوە و دەکەوێتە ناو دەریاوە ◌ ایکاروس

**ICBM** *abbreviation* intercontinental ballistic missile

مووشەکی دوورهاوێژ، مووشەکی نێوانوشکاری ◌ موشک قاره‌پیما

**ice** /aɪs/ *noun*

1 سەهۆڵ، شەختە، کاک 2 دۆندرمە، بەستەنی 3 (تافەرمی) ئەڵماس، ڕووژە (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ 1 یخ 2 بستنی 3 (عامیانه) الماس

**-ice** *suffix*

پاشگر: نـاو دروسـت دەکـا، وەک *service, police* و نـاوی ڕووت abstract noun وەک *justice* (بنەڕەت: لە *-ice* فەرەنسی، *-itia, -itius, -itium* لاتین) ◌ پسوند: اسم‌ساز

**Ice Age** /ˈaɪs eɪdʒ/ *noun*

سەردەمی سەهۆڵبەندان یان بەستەڵەک (ب.ت. بە درێژایی Pleistocene دا) ◌ عصر یخ‌بندان

**ice-axe** *noun*

(شاخەوانی) قولـنگ، پاچ(ی دووسەر) ◌ کلنگ

**iceberg** /ˈaɪsbɜːɡ, US -bɜːrɡ/ *noun*

کێوەسەهۆڵ، کێفەسەهۆڵ، شاخەسەهۆڵ، کێف یان چیای سەهۆڵی (فرێز: **the tip of an (or the) iceberg**: بەشێک لە کێشەکە، ئەوەی کە دیارە، ڕواڵەتی پرس یان دۆزەکە) ◌ کوه یخ

**iceberg lettuce** *noun*

تۆپەکاهوو ◌ نوعی کاهو

**ice-blue** *adjective, noun*

*adj* شینی کاڵ یا کەمڕەنگ *n* ڕەنگی شینی کاڵ یان ڕۆشن ◌ *adj* آبی کم‌رنگ *n* رنگ آبی روشن

**iceboat** /ˈaɪsbəʊt/ *noun*

گـەمی سەهۆڵـین یـان سەرسـەهۆڵ، گـەمی سەهۆڵبڕ ◌ ایسبوت

**icebound** /ˈaɪsbaʊnd/ *adjective*

(لەبەر سەهۆڵ) گیراو، گیرکردوو، ڕێ‌گیراو: *an -nd region* ◌ مسدود

**icebox** /ˈaɪsbɒks, US -bɑːks/ *noun*

1 سەهۆڵخانە، سەهۆڵدان 2 (کۆن) بەفرخەرە ◌ 1 یخدان 2 یخچال

**icebreaker** /ˈaɪsbreɪkə(r)/ *noun*

کەشتی سەهۆڵبڕ، کەشتی سەهۆڵشکێن ◌ کشتی یخ‌شکن

**ice-bucket** *noun*

سەهۆڵدان، قاپی سەهۆڵ ◌ ظرف یخ

**ice cap** *noun*

سەهۆڵداگرتە، سەهۆڵپۆش (ب.ت. جەمسەری باکووری و باشووری) ◌ یخ‌پهنه

**ice-cold** *adjective*

یـەکجار سـارد، وەکـوو سـەهۆڵ، کەڵلەتەزێن، سەرتەزێن ◌ بسیار سرد

**ice cream** /ˌaɪs ˈkriːm/ *noun*
دۆندرمە، بەستەنی، بەستنی، بەستوولە ◌ بستنی

**ice cream cone** *noun*
نانە دۆندرمە، نانە بەستەنی، نانەبەستوولە ◌ قیفی بستنی

**ice cream parlor** *noun*
خواردنگەی دۆندرمەفرۆش، دۆندرمەفرۆشی ◌ رستوران بستنی‌فروش

**ice-cream soda** *noun*
سۆدای دۆندرمە یان بەستەنی ◌ سودای بستنی

**ice-cube** *noun*
لەتە سەهۆڵ، قالبە سەهۆڵ، پارچە سەهۆڵ ◌ تکەی یخ

**iced** /aɪst/ *adjective*
1 بەستوو، سارد: *iced* ◊ *iced coffee/tea* 2 کەیکی سەهۆڵبەسەر یان سەربەستوو: *an -ed cake* ◌ 1 یخزدە 2 ایست *cucumber soup*

**ice dancer** *noun*
ئایس دانسێر ◌ آیس دانسر

**ice dancing** *noun*
هونەر یان وەرزشی سەما و هەڵپەڕکێ لەسەر کەوشی سەرسەهۆڵ ◌ آیس دانسینگ

**iced water** *noun*
سەهۆڵاو ◌ آب یخ

**ice-fall** *noun*
ڕیزاوی سەهۆڵ، ڕیزۆڵ (تێکەڵی ڕیزاوی سەهۆڵ) ◌ یخشار

**ice-field** /ˈaɪs fiːld/ *noun*
بەستەڵەک، بەستەڵۆک، سەهۆڵناوچە، سەهۆڵستان، سەهۆڵجار، سەهۆ(ڵە)ڵان (ب.ت. لە ناوچە جەمسەرییەکان) ◌ منطقەی یخ

**icefish** *noun, pl.* same or icefishes
1 وشەیێکی تر بۆ capelin 2 جۆرێ ماسی بێپوولەکەی scaleless ئەنتارکتیک [*Chaenocephalus aceratus*] ◌ نوعی ماهی

**ice-floe** /ˈaɪs fləʊ/ *noun*
پارچە سەهۆڵی سەراوکەوتە، لەتەسەهۆڵی سواراو ◌ یخپارە

**ice-free** *adjective*
(لەنگەرگا) بێسەهۆڵ، نەبەستوو ◌ بدون یخ

**ice hockey** *noun*
هاکی سەرسەهۆڵ ◌ هاکی روی یخ

**ice house** /ˈaɪs haʊs/ *noun*
سەهۆڵخانە (خانووێ بۆ هەڵگرتنی سەگۆڵ ◌ ایس هاوس

**Icelander** /ˈaɪslæmdə(r)/ *noun*
خەڵکی ئایسلەند ◌ اهل ایسلند

**Icelandic** /ʌɪsˈlandɪk/ *adjective, noun*
*adj* ئایسلەندی، سەربە ئایسلەند، خەڵکەکەی یان زمانەکەی، پێوەندی بە ئایسلەندەوە هەیە *n* زمانی ئایسلەندی، زمانێکی ژێرمەنی باکووری ◌ *adj* ایسلندی *n* زبان ایسلندی

**Iceland moss** *noun*
بەڵخەدار؟: کرێژەبەردی ئایسلەندی: کرێژەبەردێکی ناوچەکانی کوێستانی و باکووران arctic کە جاروبار لە بواری پزشکی و خۆراکدا بەکاردێترێ [*Cetraria islandica*] ◌ گل‌سنگ ایسلندی

**Iceland poppy** *noun*
خەشخاش یان کوکەناری ئایسلەندی: هی ناوچەکانی holarctic کە زۆرتر لەبەر گوڵە گەشە تاکەکانی دەکرێ [*Papaver nudicaule*] ◌ خشخاش ایسلندی

**Iceland spar** *noun*
جۆرێ کالسیتی calcite روونی بێڕەنگ کە خاوەنی تایبەتمەندی شکانەوەی دووچەندانەیە birefringent ◌ اسپار ایسلندی

**ice lolly** *noun*
ئەلاسکا، دۆندرمە یا بەستەنی سەهۆڵین یا بەستوو ◌ بستنی یخی، آلاسکا

**iceman** /ˈaɪsmən/ *noun, pl.* icemen
1 سەهۆڵفرۆش 2 پیاوی سەرسەهۆڵ (سەفەر) ◌ 1 یخفروش 2 آیسمن

**Iceni** /ʌɪˈsiːni, US -nʌɪ/ *noun, pl.*
خێلێکی بریتونەکانی زوو، دانیشتووی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئینگلتەرە، ئێستا دەبێتە ڕۆژهەڵاتی Anglia ◌ آیسینی

**ice-pack** *noun*
توورەکەی سەهۆڵ، توورەکەسەهۆڵ، کیسەی سەهۆڵ ◌ کیسەی یخ

**ice-pick** /ˈaɪs pɪk/ *noun*
سەهۆڵشکێن، چەکوشی سەهۆڵ، سەهۆڵبڕ ◌ یخ‌شکن

**ice plant** *noun*
1 گیای سەهۆڵین (گیایێکی ئاوداری ئەفریکای باشووری [توخمەکانی *Mesembryanthemum* و *Dorotheanthus*]) 2 جۆرێ stonecrop ی ئاسیایی [*Sedum spectabile*] ◌ آیس پلانت

**ice rink** *noun*
ڕووتەختی هاکی، (مەیدان یان) تەختەعەرزی هاکی ◌ پیست هاکی

**ice sheet** = ice cap

**ice-skate** *noun*
کەوشی سەرسەهۆڵ ◌ کفش پاتیناژ

**ice-skater** *noun*
ئایس‌سکاتێر، سکیبازی سەرسەهۆڵ ◌ ایس‌سکاتر، اسکی‌باز روی یخ

**ice-skating** = skating

**ice-tray** *noun*
جێ‌سەهۆڵ، قالبی سەهۆڵ، قالبە سەهۆڵ ◌ قالب یخ

**ice storm** *noun*

ڕەشەبایێ کە تەرزەی لەگەڵە ◌ طوفان همراه بە تگرگ

**ice water** *noun*

سەهۆڵاو، ئاوی کەللەتەزێن ◌ آب یخ

**ichneumon** /ɪkˈnjuːmən/ *noun*

1 (هەروەها ichneumon wasp یا ichneumon fly) ئیکنیومۆن: مێرووییەکی چکۆلانە کە گەراکانی لەسەر یان لەنێو لارڤای مێرووەکانی تردا دادەنێ [خێزان Ichneumonidae: زۆر جۆرن] 2 mongoose ی میسری [ Herpestes *ichneumon*] ◌ ایکنیومون

**ichnograph** /ˈɪknɑːgrɑːf/ = ground plan

**ichnography** /ɪkˈnɒgrəfi/ *noun, pl.* ichnographies

نەخشەی تەرکی خانوویێ یان نەخشەی ناوچەیێ (ichnographic *adj*) ◌ ایکنوگرافی

**ichor** /ˈʌɪkɔː/ *noun,* Greek *ichōr*

1 (لە میتۆلۆژی یۆنانیدا) خوێنی خودایان 2 (کۆن) زنچکاو، ئاوی برین ◌ 1 ایکور 2 آب جراحت

**ichorous** /ˈʌɪk(ə)rəs/ *adjective*

زنچکاولێهاتوو، ئاوی برینی لێدێ ◌ دارای آب جراحت

**ichthyic** /ˈɪkθɪɪk/ *adjective*

1 سەربە ماسی 2 ماسیئاسا، شێوەماسی ◌ 1 وابستە بە ماهی 2 ماهیمانند

**ichthyo-** /ˈɪkθɪəʊ/ *prefix*

پێشگر: ماسی، ماسیئاسا، شێوەماسی (بنەڕەت: لە *ikhthus* یۆنانییەوە "ماسی") ◌ پیشوند: ماهی، ماهیمانند

**ichthyofauna** *noun, pl.* ichthyofaunas or ichthyofaunae

ژیانی ماسییانی ناوچەیێ، ماسییانی ڕەسەنی ناوچە یان ژینگەیێ ◌ ماهیهای بومی یک منطقه یا زیستبومی

**ichthyofaunal** *adjective*

سەربە ئیکتیفاونا ◌ وابستە بە ایکتیفاونا

**ichthyoid** /ˈɪkθɪɔɪd/ *adjective*

ماسیئاسا، شێوەماسی، ماسییانە ◌ ماهیمانند

**ichthyolite** /ˈɪkθɪəlaɪt/ *noun*

بووبەرد یان فوسیلی ماسی ◌ سنگوارەی ماهی

**ichthyological** /ˌɪkθɪəˈlɑːdʒɪkl/ *adjective*

ماسیناسییانە، سەربە ماسیناسی ◌ ماهیشناختی

**ichthyologist** *noun*

ماسیناس ◌ ماهیشناس

**ichthyology** /ˌɪkθɪˈɒlədʒi/ *noun*

ماسیناسی ◌ ماهیشناسی

**ichthyophagist** *noun,* also ichthyophagous /ˌɪkθˈɪɑːfəgəs/

ماسیخۆر ◌ ماهیخوار

**ichthyophagy** *noun*

ماسیخۆری ◌ ماهیخواری

**ichthyornis** *noun*

ماسییەباڵندە: باڵندەیێکی ماسیخۆرکەئاسایی ternlike قڕتێکەوتووی سەردەمی کریتاسە، خاوەنی ددانی قووچەکی و مۆغەرەی خشۆکئاسا بووە [توخم *Ichthyornis*] ◌ ایکتیوسور

**ichthyosaur** /ˈɪkθɪəsɔː/ *noun,* ichthyosaurus /ˌɪkθɪəˈsɔːrəs/

سووسمارماسی، ماسیمێلکە (بووبەردی خشۆکێکی دەریایی سەردەمانی Mesozoic، شێوەی دولفینێکی سەردرێژ دەدا، ichthyosaurian *adj* or *n*) ◌ ایکتیوسور

**ichthyosis** /ˌɪkθɪˈəʊsɪs/ *noun*

دەردەماسی؟، ئیکتیوز، ئیکتیۆسیس: جۆرێ نەخۆشی زگماکی پێست کە دەبێتەهۆی ئەوە کە ڕووپێست وشک و زبر وەک پوولەکەی ماسی لێبێ (لەودا ئارەق و چەوری کەم دەردەدرێن) ◌ ایکتیوسیس، ایکتیوز

**ichthyotic** *adjective*

سەربە ئیکتیۆسیس (یان دەردەماسی) ◌ وابستە بە ایکتیوسیس یا ایکتیوز

**-ician** *suffix*

پاشگر: ئاماژە بە کەسێ کە پێچراوەتە بابەتێکی تایبەتی(یەوە)، پسپۆڕ لە، شارەزای: statistician (بنەڕەت: لە *-icien* فەڕەنسی) ◌ پسوند: متخصص در

**-icidal** = -icidal

**-icidally** = -icidally

**-icide** = -cide

**icicle** /ˈaɪsɪkl/ *noun*

چلوورە، کیرەکەڵە، شووشەسۆڵ، ئاوبەست، کلوو، قەندیل، سەهۆڵەشۆڕ، شۆڕەسەهۆڵ، شووشەسەهۆڵ، چیوەزمە ◌ قندیل

**icily** /ˈaɪsɪli/ *adverb*

1 وەکوو سەهۆڵ، سەهۆڵانە 2 ساردوسڕانە، بە ساردییەوە: *'I have nothing to say to you,' she said icily* ◌ 1 مثل یخ 2 با سردی

**iciness** /ˈaɪsɪnəs/ *noun*

ساردوسڕی، ساردی، کەمتەرخەمی ◌ بیتفاوتی، سردی

**icing** /ˈaɪsɪŋ/ *noun*

1 ئایسین، کەیکپۆش (تێکەڵەیێ لە شەکر، سپێنی هێلکە و بەهارات کە بەسەر کەیکەوەی دەکەن) 2 بەستنی سەهۆڵ لەسەر ماشێن یان بەستنی نێو مۆتۆر ◌ 1 رویە 2 آیسینگ

**icing sugar** *noun*

خاکەقەن(د)، شەکر(ە قەن) ◌ خاکە قند

**icky** /ˈɪki/ *adjective* (ickier, ickiest)

پیس، گوو، ناخۆش ◌ کثافت، گە

**icon** /ˈaɪkɒn, US -kɑːn/ *noun,* also ikon

1 وێنەی دینی یان ئایینی، ئەدگار، کوتەڵ،

وێنەی پیرۆز، وێنەی پێغەمبەر عیسا یان هەر کەسێکی پیرۆزی کە، لە کلێسەی بیزانتین یان کلیسەکانی تری رۆژهەڵاتی 2 نموونە، هێما 3 (کامپیوتێر) ئایکۆن، هێما یان نیشانەی وێنەیی، وێناک 4 (زمانەوانی) وێنە ◇ 1 تمثال، شمایل 2 مظهر 3 آیکون 4 (زبان‌شناسی) تصویر

**iconic** /aɪˈkɒnɪk, US -ˈkɑːnɪk/ *adjective*
1 ئەدگاری، کۆتەڵی 2 سەربە ئایکۆن، ئایکۆنی (iconically *adv*) ◇ 1 تمثالی 2 وابسته به آیکون

**iconoclasm** /aɪˈkɒnəklæzəm, US -ˈkɑːnə-/ *noun*
1 نەریتبەزێنی (رەخنەگرتن یان هێرشکردنەسەر باوەڕ و دەزگا و دامەزراوە نەریتییەکان): *the iconoclasm of the early Christians* 2 وێنەدڕێتی، کۆتەڵشکێنی ◇ 1 سنت‌شکنی 2 شمایل‌شکنی

**iconoclast** /aɪˈkɒnəklæst, US -ˈkɑːnə-/ *noun*
1 نەریتبەزێن 2 وێنەدڕ، کۆتەڵشکێن ◇ 1 سنت‌شکن 2 تمثال‌شکن

**iconoclastic** /aɪˌkɒnəˈklæstɪk, US ˌkɑːnə-/ *adjective*
نەریتبەزێنانە، نوێخوازانە ◇ سنت‌شکنانه

**iconoclastically** *adverb*
(بەشێوەیەکی) نەریتبەزێنانە ◇ بە طور سنت‌شکنانه

**iconographer** *noun*
1 ئایکۆنۆگرافێر 2 وێنەکێش ◇ 1 ایکونوگرافیر 2 شمایل‌کش

**iconographic** *adjective*, also -onographical
سەربە iconography ◇ 1 وابسته به ایکونوگرافی 2 وابسته به شمایل‌کشی

**iconography** /ˌʌɪkəˈnɒgrəfi/ *noun, pl.* iconographies
1 بەکارهێنان یان لێکۆڵینەوەی وێنە و نیشانەکان لە هونەرە دیارییەکاندا 2 وێنەکێشی ◇ 1 ایکونوگرافی 2 شمایل‌کشی

**iconolater** /ˌʌɪkəˈnɑlətə(r)/ *noun*
وێنەپەرست، ئەدگارپەرست ◇ تمثال‌پرست

**iconolatry** /ˌʌɪkəˈnɑlətri/ *noun*
وێنەپەرستی، ئەدگارپەرستی ◇ تمثال‌پرستی

**iconology** /ˌʌɪkəˈnɒlədʒi/ = symbolism

**icosahedral** *adjective*
بیستڕوو(یی) ◇ بیست‌وجهی

**icosahedron** /ˌaɪkəʊsəˈhiːrən/ *noun, pl.* icosahedra or icosahedrons
بیستڕوو(یی) ◇ بیست‌وجهی

**-ics** *suffix*
پاشگر: زانست، چالاکی، هونەر، ـناسی (بنەڕەت: لە *-iques* فەرەنسی، *-ica* لاتین یان *-ika* یۆنانی) ◇ پسوند: علم، فعالیت، فن، ـشناسی

**icteric** /ɪkˈtɛrɪk/ *adjective*
سەربە زەردوویی ◇ وابسته به یرقان

**icterus** /ˈɪkt(ə)rəs/ *noun*, also jaundice
زەردوویی (بنەڕەت: بە ڕێگای لاتینەوە، لە *ikteros* یۆنانییەوە) ◇ یرقان

**ictus** /ˈɪktəs/ *noun, pl.* same or ictuses
1 زەبر، هێز، ترپە 2 لێدان، ترپە 3 (پزشکی) لێهاتن، هێرش، لێدان ((ictal *adj* (Medicine)) ◇ 1 تکیه 2 ضربان 3 اصابت، حمله

**ICU** /ˌaɪ siː ˈjuː/ *abbreviation* intensive care unit
(لە نەخۆشخانە) بەشی چاودێری تایبەتی ◇ بخش مراقبت‌های ویژه

**icy** /ˈaɪsi/ *adjective* (icier, iciest)
1 یەکجار سارد، کەڕ 2 سەهۆڵاوی، داپۆشراو بە سەهۆڵ، سەهۆڵبەند، سەهۆڵین 3 سارد(وسڕ) ◇ 1 بسیار سرد 2 یخ‌زده 3 سرد

**id** /ɪd/ *noun*
(دەروونناسی فرۆیدی) ئید، ئەو (لە لاتینەوە "ئەو it"، وەرگێڕدراوی *es* ئەڵمانیایی، لەگەڵ ego و superego بەراوردی کە) ◇ نهاد

**I'd** /aɪd/ *abbreviation* I had, I would

**ID** /ˌaɪ ˈdiː/ *abbreviation* identification
کارتی پێناس، ناسنامە ◇ کارت شناسایی

**-idae** *suffix*
پاشگر: دەستە گیانەوەری، پۆلە گیانەوەری، مێگەلە گیانەوەری، ڕەوە ◇ پسوند: گروهی از جانوران

**-id**[1] *suffix*
پاشگر: ئاوەڵناو ساز دەکا وەک: *putrid* (بنەڕەت: لە *-ide* فەرەنسی، لە *-idus* لاتین) ◇ پسوند: صفت‌ساز

**-id**[2] *suffix*
پاشگر: 1 ناو ساز دەکا وەک: *pyramid* 2 (زیندەناسی) ناوی پێکهێنەرە پێکهاتەییەکان پێکدێنێ: *plastid* 3 (ڕووەکناسی) ناوی ئەو ڕووەکانە ساز دەکا کە سەربە خێزانێکین کە کۆتاییان بە *-idaceae* هاتووە: *orchid* (بنەڕەت: لە *-ide* فەرەنسی، لە *-idis* لاتین، لە *-is* یان *-id-* یۆنانی) ◇ پسوند: 1 اسم‌ساز 2 و 3 اید

**-id**[3] *suffix*
پاشگر: (ناو دروست دەکا) 1 (گیانەوەرناسی) ئاماژە بە گیانەوەرێکی سەربە خێزانێ کە ناوەکەی کۆتایی بە *-idae* هاتووە یان پۆلێ کە ناوەکەی کۆتایی بە *-ida* هاتووە: *arachnid* 2 ئاماژە بە ژمارەیێ خێزان یان بەرە (پاتشایی)یێکی تایبەتی: *Abbasid*، *Fatimid* 3 (ئەستێرەوانی) ئاماژە بە meteor ێ یان هەسارەیێکی چکۆلەی گەلەئەستێرەیێ یان ئەستێرەیێکی کلکدار: *Perseid*، *Geminids* (بنەڕەت: لە *-ides* لاتین (کۆ: *-idae*، *-ida*)، لە

یۆنانی‌یەوە) ◌ پسوند: اید

**Idahoan** /ˈʌɪdəhəʊən/ *noun, adjective*

*n* ڕەسەن یان دانیشتووی هەرێمی ئایداهۆ Idaho ی ئەمریکا *adj* سەربە یان پێوەندی بە ئایداهۆوە هەیە، ئایداهۆیی ◌ ایداهویی

**ID card** *noun*

کارتی پێناس، ناسنامە، کارتی ناسین ◌ کارت شناسایی

**ide** /ʌɪd/ = orfe

**-ide** *suffix*

پاشگر: (کیمیا، ناو ساز دەکا) ئاوێتەی دوو توخمی، ئاوێتەی دوو ڕەگەزی، ئاماژە بە ئاوێتە دووانی‌یەکانی توخم یان کۆمەڵێکی ناکانزایی :non-metallic *chloride*؛ ئاماژە بە ئاوێتەکانی تر: *peptide*؛ ئاماژە بەو توخمانەی زنجیرەیێ لە :periodic table *lanthanide* ◌ پسوند: ترکیب دو عنصری، اید

**idea** /aɪˈdɪə, US -ˈdiːə/ *noun*

1 وێنەی مێنتاڵ، بیر، هزر، بیرۆکە، ئایدیا، ئیدە: *I've had a brilliant idea!* 2 ئامانج، ئارمانج، نیاز، خەیاڵ، نیهات، مەبەست 3 واتا، مانا 4 وێنا، بۆچوون، ڕا، دیتن، نێرین، باوەڕ 5 گومان، مەزندە، پێوابوون، ئاگاداری، زانیاری، هایداری 6 پلان، نەخشە 7 نموونەی ڕاستەقینە (بنەڕەت: بە ڕێگای لاتین لە *idea* یۆنانی "شێوە، نموونە"، لە بنکی *idein* "دیتن، بینین") ◌ 1 صورت ذهنی، فکر، اندیشه، مثال 2 مقصود، نیت، آرمان 3 معنی 4 تصور، عقیده، نظر 5 حدس، خبر 6 طرح 7 مثال واقعی

**ideal** /aɪˈdiːəl/ *adjective, noun*

*adj* (یەکجار) خۆش، لەبار، دڵخواز، (زۆر) گونجاو، ئایدیاڵ، تەواو: *This beach is ideal for children*، خەیاڵی، ئەندێشەیی، لەسەر بنچینەی بۆچوون، وادانراو، ناڕاستەقینە، بۆچوونی: *the search for ideal love* ◊ *In an ideal world there would be no poverty and disease* *n* 1 پێودانگی تەواوی: *political ideals* 2 نموونەی تەواو، نموونە، ئایدال ◌ *adj* مطلوب، کامل، خیالی، تصوری *n* 1 معیار کمال 2 کمال مطلوب

**idealism** /aɪˈdiːəlɪzəm/ *noun*

(لە بواری فەلسەفە، هونەر و ویژەدا) ئایدیالیزم، ئایدیاباوەری، ئیدەباوەری، ئایدیاگەری، نموونەباوەری: *idealism has no place in modern politics* (بڕوانە materialism و realism) ◌ ایدەآلیسم، آرمان‌گرایی

**idealist** /aɪdiəˈlɪst/ *noun*

ئایدیالیست، ئایدیاباوەڕ، ئیدەباوەڕ، ئایدیاگەر، نموونەباوەڕ ◌ ایدەآلیست، آرمان‌گرا

**idealistic** /ˌaɪdiəˈlɪstɪk/ *adjective*

ئایدیالیستی، ئایدیالیستی‌یانە، ئایدیاباوەڕانە، ئیدەباوەڕانە، ئایدیاگەری‌یانە، نموونەباوەڕی‌یانە: ◌ *She's still young and idealistic* ایدەآلیستی، آرمان‌گرایانە

**idealistically** /ˌaɪdiəˈlɪstɪkli/ *adverb*

ئایدیالیستانە، نموونەباوەڕانە، بە شێوەیێکی ئیدەباوەڕانە یان ئایدیالیستی ◌ بەطور ایدەآلیستی

**ideality** /ˌaɪdɪˈalɪti/ *noun, pl.* idealities

بەپێی نموونەی تەواوبوون ◌ مطابق با نمونەی کامل بودن

**idealization** /aɪˌdiːəlaɪˈzeɪʃn, US -ləˈz-/ *noun*

نموونەیی‌کردن، نموونانْدن، وەکوو ئایدیال خستنەڕوو ◌ آرمانی‌سازی

**ideally** /aɪˈdiːəli/ *adverb*

بە شێوەیەکی نموونەیی یان یەکجار خۆش، بە بۆچوون: *She's ideally suited for this job* ◌ بە طور ایدەآل، تصوراً

**ideal of life** *noun*

مەبەستی ژیان، ئامانجی ژیان ◌ آرمان زندگی

**ideas** *noun, pl.*

ئایدیاکان، نموونەکان، نموونان ◌ مُثُل

**ideation** /ˌaɪdiˈeɪʃn/ *noun*

وازانین، پێوابوون، خەیاڵ‌کردنەوە ◌ تصور

**ideational** /ˌaɪdiˈeɪʃnl/ *adjective*, also ideative

خەیاڵی، وازانراو، پێوابوو ◌ تصوری

**ideationally** *adverb*

بە شێوەیێکی خەیاڵی، خەیاڵی‌یانە، وازانراوانە، پێوابووانە ◌ بە طور تصوری

**idée fixe** /ˌiːdeɪ ˈfiːks/ *noun, pl.* idées fixes pronunc. same

(فەرەنسی) کەڵکەڵە، خولیا، سەرقاڵی، بیرۆکەی چەسپیو، obsession ◌ دل‌مشغولی، ایدەی ثابت

**idem** /ˈɪdem/ *adjective, noun*

هەر ئەو، هەمان سەرچاوە، هەر ئەو ژێدەرە، هەر ئەو نووسەر، هەمان نووسەر (بنەڕەت: لاتین "هەمان") ◌ همان، همان مأخذ، همان نویسنده

**idempotent** /ˌʌɪdɛmˈpəʊt(ə)nt, ʌɪˈdɛmpət(ə)nt/ *adjective, noun*

هەمان‌توانا؟: سەربە چەندێتی‌یێکی ماتماتیکی‌یەوە ◌ ایدمپوتنت

**ident** /ˈaɪdent/ *noun*

(بریتانیا) پارچە موسیقا یان کورتە فیلمێ کە لە نێوان بەرنامەکاندا بڵاو دەبێتەوە (و ناوی وێستگەی ڕادیۆیی یان کاناڵی تەلەفزیۆنی‌یەکەت پێدەڵێ): *The idents act as a branding device* ◌ ایدنت

**identical** /aɪˈdentɪkl/ *adjective*

1 هەر ئەو، هەمان شت، وەکوو یەک، یەکێ، وەکیەک، عەینی یەک، هاوشێوە، تەواولێکچوو، چونیەک، هەمان، یەک‌چەشن، یەک‌جۆر،

*a row of identical* :دروست وەکوو یەک *houses* 2 (دووانەکان) لە یەک هێلکۆکەی پیتێنراوەوە پەرەیان سەندووە، جا کەوایە وەک یەک وان (بڕوانە fraternal) ◊ 1 همان، همانند، کاملاً شبیه 2 ادنتیکال

**identically** /-kli/ *adverb*
دروست وەکوو یەک، وەک یەک: *The children were dressed -lly* ◊ به طور یکسان

**identical twins** *noun, pl.*
جمکی وەکیەک، دووانەی هەروەک یەک ◊ دوقلوهای همانند

**identifiable** /aɪˌdentɪˈfaɪəbl/ *adjective*
1 دیار، بەرچاو، روون، رۆشن، خۆیا 2 لەناسینەوەهاتوو، شایانی لێکگردنەوە: *-le* ◊ *characteristics* *The house is easily identifiable by the large tree outside* 1 ◊ مشخص، واضح 2 قابل تشخیص

**identifiably** /aɪˌdentɪˈfaɪəbli/ *adverb*
1 بە شێوەیێکی دیار یان بەرچاو 2 لەناسینەوەهاتووانە ◊ 1 به طور مشخص 2 به طور قابل تشخیص

**identification** /aɪˌdentɪfɪˈkeɪʃn/ *noun*
1 ناسینەوە، لێکگردنەوە: *Each product has a number for easy identification* 2 ناسنامە و هتد: *the voters' identification of the Democrats with high* ◊ 1 شناسایی 2 اوراق شناسایی

**identification parade** *noun*
ریز کردن بۆ ناسینەوە ◊ بە خط کردن تعیین هویت

**identikit** /aɪˈdentɪkɪt/ *noun, adjective*
*n* رووهەڵگرتنەوە *adj* = formulaic ◊ چهرەنگاشت

**identity** /aɪˈdentəti/ *noun, pl.* identities
1 لێکچوویی، وەکیەکی، یەکیبوون، یەکێتی، عەینی یەکبوون، تەواو لێکچوون، یەکشێوەیی، هەروەک یەکبوون، هەرئەوبوون، هەمانبوون، هەمانی، یەکجۆری، هاوچەشنی: *There's a close identity between fans and their team* ◊ *Their identities were kept secret* 2 ناسنامە، کەسایەتی، کێیەتی: *a sense of national/cultural/personal/group identity* ◊ *a plan to strengthen the corporate identity of the company* ◊ 1 یکسانی، همانندی، عینیت 2 هویت، شخصیت

**identity card** *noun*, also identity disc
کارتی ناسینەوە، جزدان، کارتی ناسین، ناسنامە، کارتی پێناس ◊ کارت شناسایی

**identity crisis** *noun*
قەیران یان تەنگژەی ناسنامە، قەیرانی کێیەتی ◊ بحران هویت

**identity parade** = identification parade

**ideo-** *prefix*
پێشگر: بیر، هزر، ویر، بیرۆکە: *ideogram* (بنەڕەت: لە *idea* یۆنانییەوە "form") ◊ پیشوند: اندیشه، فکر

**ideogram** /ˈɪdiəgræm/ *noun*
1 (ب.ت. لە چینی‌دا، پیتی) بیرنوێن، بیردەرخەر 2 بەرژەنگ، نیشانە، هێما (ideogramic or ideogrammatic *adj* ؛ideogrammic *adj*) ◊ 1 اندیشەنگار 2 نماد، علامت

**ideograph** /ˈɪdiəgrɑːf, US -græf/ = ideogram

**ideographic** *adjective*, also ideographical
بیردەرخەرانە، سەربە بیردەرخەر ◊ وابسته به اندیشەنگار

**ideographically** *adverb*
بیردەرخەرانە، بە شێوەیەکی بیردەرخەر ◊ به طور اندیشەنگار

**ideography** *noun*
نیشانەدانان، هێمادانان، هێمانووسی، نیشانەنووسی، نواندنی نیشانە یان هێماکان (بە نیشانەی نووسراو و گرافیکی)؛ بەکارهێنانی نیشانەکان ◊ علامت‌گذاری، علامت‌نگاری؛ ایدئوگرافی

**ideological** /ˌaɪdiəˈlɒdʒɪkl, US -ˈlɑːdʒ-/ *adjective*, also ideologic
بیروباوەڕییانە، سەربە ئایدیۆلۆژی، ئایدیۆلۆژیکی: *ideological differences* ◊ مکتبی، وابسته به ایدئولوژی

**ideologically** /-kli/ *adverb*
لەباری ئایدیۆلۆژی(یەوە): *ideologically correct* ◊ از نظر ایدئولوژی

**ideologist** /ˌaɪdiˈɒlədʒɪst, US -ˈɑːl-/ = ideologue

**ideologue** /ˈaɪdiəlɒg, ˈɪd-, US -lɔːg, -lɑːg/ *noun*
تیۆریدانەر، بیردۆزدانەر، ئایدیۆلۆگ، ئیدۆلۆگ ◊ نظریه‌پرداز

**ideology** /ˌaɪdiˈɒlədʒi, US -ˈɑːl-/ *noun, pl.* ideologies
1 ئایدیۆلۆژی 2 بیروباوەڕ، ڕێباز ◊ 1 ایدئولوژی 2 مرام، مکتب

**ides** /aɪdz/ *noun, pl.*
(لە ڕۆژمێری ڕۆمی کۆندا) ڕۆژی پازدەیەمی مانگەکانی March، May، Julay و October و سێزدەی مانگەکانی تر ◊ آیدز

**id est** *adverb*
(لاتین) واتا، یانی، ئانکو، that is ◊ یعنی

**idio-** /ˈɪdɪəʊ/ *prefix*
پێشگر: 1 خۆ، هی خۆ، خود، کەسی، جیا، جوودا، جیاواز، دیار، تایبەتی: *idiotype* 2 (کیمیا و پزشکی) خۆبەخۆ یان *idioblast*

خودبەخود پێکهاتوو یان بەرهەمهاتوو، لەخۆوە پێکهاتوو (بنەڕەت: لە *idios* یۆنانییەوە " own, distinct") ◯ پێشوند: 1 خود، شخصی، جدا، مشخص، خصوصی 2 خود بە خود ایجادشده، تولید خودی

**idioblast** *noun*
خانەی تایبەتی، تایبەتخانە، جیا(واز)خانە: خانەیێکی ڕووەکی (وەک sclereid) کە لەگەڵ خانە دراوسێکانی جیاوازی هەیە ◯ ایدیوبلاست

**idioblastic** *adjective*
سەربە خانەی تایبەتی، پێوەندی بە تایبەتخانەوە هەیە، سەربە جیاخانە یان جیاوازخانە، جیاوازخانەیی ◯ وابستە بە ایدیوبلاست

**idiocy** /ˈɪdiəsi/ *noun, pl.* idiocies
کەریتی، کەروگەوجیتی، نەفامی، گەوجیتی، کردەوەی گەوجانە، کاری کەرانە: *the idiocies of bureaucracy* ◯ حماقت، عمل احمقانە

**idiolect** /ˈɪdiəlekt/ *noun*
زمانی تایبەتی کەسێ ◯ گویش یا لهجەی فردی

**idiolectal** *adjective*
سەربە زمانی تایبەتی کەسێ ◯ وابستە بە گویش یا لهجەی فردی

**idiom** /ˈɪdiəm/ *noun*
1 زاراوە، بێژە 2 زمان، دەقۆک، زاراوە، شێوەزار 3 شێوەی دەربڕین، شێوازی هێنانەزمان 4 شێواز، بەکارهێنانی زمانی تایبەت بە قۆناخ یان تاکەکەسێ ◯ 1 اصطلاح 2 زبان، لهجە، گویش 3 نحوەی بیان 4 سبک

**idiomatic** /ˌɪdiəˈmætɪk/ *adjective*
1 زاراوەیی، بێژەیی، زاراوەی تایبەتی زۆر تیایە، باو: *She speaks fluent and idiomatic English* 2 پڕ(لە)زاراوە (ی زمانی)؛ تایبەت بە گرووپ، کەس یان شێوازێکی تایبەتی: *an idiomatic expression* (idiomaticness *n*) ◯ 1 اصطلاحی، رایج 2 پر از مصطلح؛ خاص گروە، فرد یا سبک ویژە

**idiomatically** /-kli/ *adverb*
وەکوو دەڵێن، وەک دەڵێن، بە زمانی ڕەمەکی ◯ اصطلاحاً

**idiopathic** *adjective*
سەربە نەخۆشی سەربەخۆ یان لەخۆوە، هۆنەزانراو، *idiopathic epilepsy* :primary (idiopathically *adv*) ◯ وابستە بە بیماری جداگانە

**idiomorphic** *adjective*
تایبەتشێوە، شێوە یان بیچمێکی تایبەت بە خۆی هەیە، خاوەنی شێوە یان بیچمی گونجاوی خۆی ◯ ایدیومورفیک

**idiopathy** /ˌɪdɪˈɒpəθi/ *noun, pl.* idiopathies
نەخۆشی سەربەخۆ یان جیا، نەخۆشی لەخۆوە (هۆیەکەی نازانری) ◯ بیماری جداگانە

**idiosyncrasy** /ˌɪdiəˈsɪŋkrəsi/ *noun, pl.* idiosyncrasies
1 تایبەتمەندی تاکەکەسی (یان جیاواز)، ڕەفتارسەیری، شێوەی بیرکردنەوەی تایبەت: 2 *The car has its little -yncrasies* پێنەکەوتنی تاکەکەسی، کاردانەوەی نائاسایی جەستەیی کەسێ، کاردانەوەی تاکەکەسی (دەرمان، خۆراک و هتد) ◯ 1 خصیصەی فردی 2 حساسیت فردی

**idiosyncratic** /ˌɪdiəsɪŋˈkrætɪk/ *adjective*
نائاسایی، سەیر: *His teaching methods are idiosyncratic but successful* ◯ غیرمتعارف

**idiot** /ˈɪdiət/ *noun*
1 (نافەرمی) بنیادەمی کەر، کەسێکی گەوج، کەسێکی خەرەفاو 2 کەسێکی لەباری هۆشییەوە دواکەوتوو ◯ 1 آدم احمق، آدم سفیە 2 عقبافتادەی ذهنی

**idiot box** *noun*
(نافەرمی، ئەمریکا، دەزگای) تەلەفزیۆن ◯ تلویزیون

**idiotic** /ˌɪdiˈɒtɪk, US -ˈɑːtɪk/ *adjective,* also idiotical
گەوج، سەفی، خەرەفاو، گەوجانە، دەبەنگانە، کەرانە، *an idiotic question* :foolish ◊ *Don't be so idiotic!* ◯ سفیە، احمقانە

**idiotically** /-kli/ *adverb*
کەرانە، گەوجانە، دەبەنگانە ◯ ابلهانە، احمقانە

**idiotism** /ˈɪdɪətɪzm/ *noun*
کەریتی، گەوجیتی، idiocy ◯ بلاهت

**idiot light** *noun*
(نافەرمی) چرای تێکچوون یا کێشە (ی تکنیکی) ◯ چراغ نقص

**idiot savant** /ˌiːdjəʊ saˈvɒ̃, ˌɪdɪəʊ/ *noun, pl.* idiot savants or idiots savants pronunc. same
کەسێ کە وابیر دەکرێتەوە لەباری هۆشییەوە دواکەوتوو بێ بەڵام لە بوارێکی تایبەتیدا شارەزایی یان بەهرەیێکی سەیری هەیە (وەک لە بواری موسیقا یان لێکدانەوەی ژمارە و حیسابدا، واتای خوی گەوجی شارەزا یان زانا learned idiot) ◯ ایدیو ساوا

**idiotype** /ˈɪdɪə(ʊ)tʌɪp/ *noun*
سەرجەم هۆکارە دیاریکەرە ژێنێتیکییەکانی کەسێ genetic determinants ◯ ایدوتیپ

**idiotypic** *adjective*
سەربە ئیدیۆتایپ ◯ ایدوتیپ

**-idium** *suffix, pl.* -idiums or -idia
پاشگر: بچووک، چکۆلە: *antheridium* (بنەڕەت: لاتینی نوێ، لە *-idion* یۆنانی "پاشگری چکۆلاندن") ◯ پسوند: کوچک

**idle** /ˈaɪdl/ *adjective* (idler, idlest)

**inalterable** /ɪn'ɔ:lterəbl/ *adjective*
لەگۆڕان‌نەهاتوو، ناگۆڕدرێ ◌ دگرگونی‌ناپذیر، تغییرناپذیر

**inalterably** /ɪn'ɔ:lterəbli/ *adverb*
لەگۆڕان‌نەهاتووانە، بە شێوەیێ کە نەگۆڕدرێ ◌ بە طور تغییرناپذیر

**inamorata** /ɪn,æmə'rɑ:tə/ *noun, fem.* inamorata. *pl.* -os or inamoratas
یار، گراو، دڵدار، دلبەستە، خۆشەویست ◌ معشوقە

**inane** /ɪ'neɪn/ *adjective*
گەوجانە، کەرانە، بێ‌واتا، هیچەکە، قۆڕ: *an -e remark* ◌ احمقانە، بی‌معنی

**inanely** /ɪ'neɪnli/ *adverb*
گەوجانە، کەرانە: *to grin inanely* ◌ احمقانە

**inanimate** /ɪn'ænɪmət/ *adjective*
1 بێ‌گیان، بێ‌ڕۆح، نازیندە، نەزیندوو، ناگیان‌لەبەر، بێ‌جان: *2 an -imate body* ماندووکەر ◌ 1 فاقد حیات، بی‌جانو غیرذی‌روح 2 کسل‌کنندە

**inanimately** /ɪn'ænɪmətli/ *adverb*
بە شێوەیەکی بێ‌گیان، نازیندانە ◌ بە طور بی‌جان

**inanition** /,ɪnə'nɪʃ(ə)n/ *noun*
پووچەڵی، بۆشی، کزی، ڕەقەڵی، لەڕی، بێ‌گیانی، بێ‌گوڕی، بێ‌تینی ◌ پوکی، لاغری، بی‌روحی

**inanity** /ɪ'nænəti/ *noun, pl.* inanities
گەوجی، کەریتی، کاری گەوجانە، بێ‌واتایی، قۆڕی، پووچی، هیچی ◌ حماقت، بی‌معنایی

**inappellable** *adjective*
لەپیاچوونەوەنەهاتوو، پیاچوونەوەی بەسەرا دەکرێ ◌ استیناف‌پذیر

**inappetence** *noun,* also inappetency
بێ‌ئیشتیایی (ب.ت. ڤیتیرنیری) ◌ بی‌اشتهایی

**inappetent** *adjective*
بێ‌ئیشتیا ◌ بی‌اشتها

**inapplicability** /,ɪnəplɪkə'bɪlɪtɪ/ *noun*
کاربێ‌نەکراوی، لەکاربێ‌کردن‌نەهاتوویی، لەجێبەجێ‌نەهاتوویی، جێبەجێ‌نەکراوی، نەگونجاوی، ناپێوەندیداری، پێوەندی پێوەنەبوون ◌ غیرقابلیت اجرا، نامناسب بودن، بی‌ارتباطی

**inapplicable** /,ɪnə'plɪkəbl, US ɪn'æplɪkəbl/ *adjective*
1 بەرنەکەوتوو، دانەگرتوو، دایناگرێ، جێبەجێ ناکرێ، کاربێ‌نەکراو، لەکاربێ‌کردن‌نەهاتوو، لەجێبەجێ‌نەهاتوو، جێبەجێ‌نەکراو: *These regulations are inapplicable to international students* 2 نەگونجاو، ناپێوەندیداری، بێ‌پێوەندی ◌ 1 غیرشامل، غیرقابل اجرا 2 نامناسب، بی‌ارتباط

**inapplicably** /,ɪnə'plɪkəbli, US ɪn'æplɪkəbli/ *adverb*
لەجێبەجێ‌نەهاتووانە، جێبەجێ‌نەکراوانە ◌ بە طور غیرقابل اجرا

**inapplication** *noun*
کەم‌تێکۆشان، دریخی، کەمتەرخەمی، سستی ◌ سستی

**inapposite** /ɪn'apəzɪt/ *adjective*
نەگونجاو، نالەبار، بێجێ، نابەجێ ◌ بی‌مورد، بی‌مناسب

**inappositely** /ɪn'apəzɪtli/ *adverb*
نەگونجاوانە، بێجێیانە ◌ بە طور بی‌مورد یا بی‌مناسب

**inappositeness** /ɪn'apəzɪtnəs/ *noun*
نەگونجاوبوون، بێجێبوون ◌ بی‌مورد بودن، بی‌مناسب بودن

**inappreciable** /,ɪnə'ri:ʃəbl/ *adjective*
کەم، هیچ، ناگرنگ، شتێک نییە ◌ جزئی، ناچیز

**inappreciably** /,ɪnə'ri:ʃəbli/ *adverb*
کەمانە، (بە شێوەیەکی) زۆر کەم ◌ بە طور نامحسوس

**inappreciation** *noun*
تێنەگەیشتن، پێنەزانین ◌ عدم درک

**inappreciative** *adjective*
تێنەگەیشتوو، پێنەزان ◌ فاقد ادراک، درک‌نکنندە

**inapprehensible** /,ɪnærɪ'hensebl/ *adjective*
لەتێگەیشتن‌نەهاتوو، لە تێگەیشتن نایە ◌ غیرقابل درک

**inapprehension** /,ɪnærɪ'henʃn/ *noun*
تێنەگەیشتن، پێنەزانین ◌ عدم درک

**inapproachable** /,ɪnə'prəʊtʃəbl/ *adjective*
1 دەس‌پێرانەگەیشتوو، گیرنەکەوتوو، دەس‌نەکەوتوو، بەردەس‌نەکەوتوو 2 بێ‌هاوتا، بێ‌وێنە ◌ 1 غیرقابل حصول 2 بی‌نظیر

**inappropriate** /,ɪnə'prəʊpriət, US -'prəʊ-/ *adjective*
بێجێ، نابەجێ، بێ‌ڕێ‌وجێ، بێ‌وەچ، بێ‌ڕێ، نەگونجاو، نالەبار: *inappropriate behaviour/language* ◌ نامناسب، بی‌مورد

**inappropriately** /,ɪnə'prəʊpriətli, US -'prəʊ-/ *adverb*
بە شێوەیەکی نەگونجاو، نالەبارانە ◌ بە طور نامناسب

**inappropriateness** /,ɪnə'prəʊpriətnəs, US -'prəʊ-/ *noun*
نەگونجاوی، نالەباری، بێ‌ڕێ‌وجێ‌بوون ◌ نامناسب بودن

**inapt** /ɪn'æpt/ *adjective*
1 بێ‌دەسەلات، بەیدەس، لێنەهاتوو، هیچ 2 نالەبار، نەگونجاو، نەشیاو، بێجێ، ناپێوەندیدار، لێنەهاتوو، لێنەوەشاو: *an inapt analogy* ◌ 1

بی‌عرضه 2 نامناسب، بی‌ربط، ناقابل

**inaptitude** /ɪn'æptɪtjuːd, US ɪn'æptɪtuːd/ *noun*
نەبوونی توانایی، بێ‌توانستی، بێ‌بەهرەیی، بێ‌جەوهەری، بێ‌توانایی، لێنەهاتوویی، لێنەوەشاوەیی ◌ بی‌استعدادی، بی‌لیاقتی

**inaptly** /ɪn'æptli/ *adverb*
لێنەهاتووانە ◌ از روی بی‌لیاقتی

**inaptness** /ɪn'æptnəs/ *noun*
لێنەهاتوویی، لێنەوەشاوەیی ◌ بی‌لیاقتی

**inarguable** = unarguable

**inarguably** = unarguably

**inarticulate** /ˌɪnɑː'tɪkjələt, US -ɑːr'tɪk-/ *adjective*
1 (قسە) نادەنکەدەنکە، لێ‌تێنەگەیشتوو، دان‌پیانەهێناو، بەڕوونی دەرنەبڕاو 2 بێ‌دەم‌وپل، بێ‌دەم‌ودوو، بێ‌دەم‌ودان 3 بێ‌زمان، لاڵ 4 بێ‌جومگە ◌ 1 نامفهوم 2 فاقد قدرت بیان 3 گنگ 4 فاقد مفصل

**inarticulately** /ˌɪnɑː'tɪkjələtli, US -ɑːr'tɪk-/ *adverb*
لێ‌تێنەگەیشتووانە ◌ به طور نامفهوم

**inarticulateness** /ˌɪnɑː'tɪkjələtnəs, US -ɑːr'tɪk-/ *noun*
بێ‌دەم‌وپلی، بێ‌دەم‌ودوویی ◌ فقدان قدرت بیان

**inartifical** /ˌɪnɑːtə'fɪʃl/ *adjective*
نادەسکرد (inartifically *adv*: نادەسکردانە) ◌ غیرمصنوعی

**inartistic** /ˌɪnɑː'tɪstɪk/ *adjective*
هونەرنەناس، ناشارەزا یان لێنەهاتوو لە بواری هونەردا، بێ‌هونەر، ناهونەری ◌ فاقد استعداد هنری، غیرفنی

**inartistically** /ˌɪnɑː'tɪstɪkli/ *adverb*
ناهونەری‌یانە، بە شێوەیەکی ناهونەری ◌ به طور غیرهنری

**inasmuch as** /ˌɪnəz'mʌtʃ əz/ *adverb*
چون، چونکە، لەبەر ئەوە کە، تا ئەو جێگای کە: *He was a very unusual musician -ch as he was totally deaf* ◌ زیرا، تا جایی که

**inattention** /ˌɪnə'tenʃn/ *noun*
سەرنج‌پێنەدان، بەهێندنەگرتن، گوێ‌پێنەدان، لامەرلایی، سەرچڵی، هەڵەشەیی، کەمتەرخەمی ◌ عدم توجه، بی‌توجهی

**inattentive** /ˌɪnə'tentɪv/ *adjective*
کەمتەرخەم، گوێ‌پێنەدەر، بێ‌گوێ، هەڵەشە، سەرچڵ، لامەرلا، بێ‌سەرنج (inattentively *adv*: بێ‌سەرنجانە، سەرچڵانە، کەمتەرخەمانە؛ inattentiveness *n*: گوێ‌پێنەدان، پشت‌گوێ‌خستن) ◌ بی‌توجه، بی‌اعتنا

**inaudibility** /ɪnˌɔːdə'bɪləti/ *noun*
نەبیستراوی، دەنگ‌نەهاتوویی، (دەنگ) نزمی، لەبیستن‌نەهاتوویی، لەژنەفتن‌نەهاتوویی ◌ شنودەنشدگی

**inaudible** /ɪn'ɔːdəbl/ *adjective*
نەبیستراو، دەنگ‌نەهاتوو، نزم، نابیسرێ، نەبیستەنی، لە بیستن یان ژنەفتن نایێ، لەبیستن‌نەهاتوو، کەم، (دەنگ) نەگەیشتوو: *The whistle was* ◊ *inaudible comments* *inaudible to the human ear* ◌ شنیدەنشدنی

**inaudibly** /ɪn'ɔːdəbli/ *adverb*
نەبیستراوانە، دەنگ‌نەهاتووانە ◌ به طور شنیدەنشدنی

**inaugural** /ɪ'nɔːgjərəl/ *adjective, noun*
1 *adj* سەربە کردنەوەیی، کرانەوەیی: *the President's* ◊ *the -gural address* *inaugural meeting of the geographical society* 2 سەرەتایی، بەرایی *n* وتاری کرانەوە یان کردنەوە (inauguratory *adj*) ◌ 1 *adj* وابسته به افتتاح 2 آغازین *n* سخنرانی افتتاحی

**inauguration** /ɪˌnɔːgjə'reɪʃn/ *noun*
کردنەوە، کرانەوە، سەرەتا، بەرایی، دەسپێک: *an* ◊ *the President's inauguration* *inauguration speech* ◌ گشایش، آغاز

**inaugurator** *noun*
بنیاتنەر، قەکر، دەس‌پێکەر ◌ افتتاح‌کننده، شروع‌کننده

**inauspicious** /ˌɪnɔː'spɪʃəs/ *adjective*
ناپیرۆز، ڕەش، سەرەخۆرە، بێ‌ودم، نگریس، بەیووم، گۆتاڵ، جووت‌قوشە، بێ‌فەڕ، شووم، نەحس: *an -icious start* ◌ بدشگون، منحوس

**inauspiciously** /ˌɪnɔː'spɪʃəsli/ *adverb*
سەرەخۆرانە، بە شێوەیەکی بێ‌ودم ◌ به طور نامیمون

**inauspiciousness**/ˌɪnɔː'spɪʃəsnəs/ *noun*
ناپیرۆزی، نگریسی، سەرەخۆرەیی، بێ‌ودمی، بێ‌ڕەشی، بەدشومی، بێ‌فەڕی ◌ نامیمونی، نحوست، شوم بودن

**inauthentic** /ˌɪnɔː'θentɪk/ *adjective*
باوەرپێنەکراو، بێ‌بنچینە، متمانەپێنەکراو ◌ نامعتبر، ناموثق

**inauthentically** *adverb*
باوەرپێنەکراوانە ◌ به طور نامعتبر

**inauthenticity** /ˌɪnɔːθen'tɪsəti/ *noun*
جێی‌باوەرنەبوون، باوەرپێنەکراوی، بێ‌بنچینەیی، متمانەپێنەکراوەیی ◌ نامعتبر بودن

**inauthoritative** *adjective*
بێ‌دەسەلات ◌ بی‌قدرت

**in-between** *adjective*
لە نێوەڕاست، مابەین، لەنێوان ◌ در وسط

**inboard** /'ɪnbɔːd, US -bɔːrd/ *adjective, adverb, noun*
*adj* (موتۆری بەلەم یان فڕۆکە) لەنێوەوە، نزیک

به چەق یان تەوەر: *adv an inboard spoiler* بەرەو نێوەوە، بەرەو ژوورەوە *n* گەمی‌یێکی وا *adj* ◌ داخلی، نزدیک محور یا مرکز *adv* بە سوی داخل *n* اینبورد

**inborn** /ˌɪnˈbɔːn, US -ˈbɔːrn/ *noun*
1 زگماکی، خۆماک، خودایی، زاتی، سروشتی، *Some people have an inborn* :innate hereditary = 2 *tendency to put on weight* inherited ◌ ذاتی، فطری

**inbound** /ˈɪnbaʊnd/ *adjective*
بەرەو نێوەوە، بەرەو ژوورەوە، بەرەو نێوەند: *inbound flights/passengers* ◌ بە سوی داخل

**in box** = in tray

**inbred** /ˌɪnˈbred/ *adjective*
زگماکی، خۆماک(ی)، خودایی، خۆیی، زاتی، سروشتی: *an inbred love of freedom* ◌ ذاتی، فطری، مادرزادی

**inbreeding** /ˈɪnbriːdɪŋ/ *noun*
بەرهەمهاتن یان زاوزێ‌کردن لەنێو خۆدا، جووت‌بوونی نێوخۆیی، زاوزێی نێوخۆیی (دەستەیێ لە گیانەوەران یان خەڵک) ◌ درون‌همسری

**inbuilt** /ˈɪnbɪlt/ *adjective*
زگماکی، خۆماک(ی)، خودایی، زاتی، سروشتی ◌ ذاتی، فطری

**inc.** *abbreviation* 1 including 2 inclusive

**Inc.** /ɪŋk/ *abbreviation* incorporated

**Inca** *noun*, also **Inka**
1 ئەندامی گەلێکی سوورپێستی ئەمریکای باشووری کە لە چیاکانی ئاندی ناوەندی بەرلە داگیرکردنی سپانیا دەژیان 2 دەسەڵاتداری بەرزی ئەو گەلە (بنەرەت: واتا: دەسەڵاتداری ئیمپراتۆری ئینکا) ◌ اینکا

**inca** *noun*
جۆرێ hummingbirdی ئەمریکای باشووری، زۆرتر بە پەڕوباڵی زەردی قاوەیی یا رەشباوەوە [تۆخم *Coeligena*: چوار جۆرن] ◌ اینکا

**Incaic** /ɪŋˈkeɪɪk/ *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە Inca ـەوە هەیە، ئینکایی ◌ وابسته به اینکا

**Incan** *adjective*
ئینکایی ◌ اینکایی

**incalculability** /ɪnˌkælkjələˈbɪlɪti/ *noun*
لەژماردن‌نەهاتوویی، نەژمێردراوی، بێ‌ئەژماری، لەژماربەدەری، پێش‌بینی‌نەکراوی، لەلێکدانەوەنەهاتوویی ◌ بی‌شماری، غیرقابلیت محاسبه

**incalculable** /ɪnˈkælkjələbl/ *adjective*
1 بێ‌ئەژمار، لە رادەبەدەر، لەژماردن‌نەهاتوو، لەژماربەدەر، نەژمێردراو، پێش‌بینی‌نەکراو، لەلێکدانەوەنەهاتوو: *2 incalculable damage* وازی‌وازی، تاوتاو، رارا ◌ 1 بی‌شمار، غیرقابل محاسبه 2 دمدمی

**incalculably** /-əbli/ *adverb*
بە شێوەیەکی بێ‌ژمار، لەژماردن‌نەهاتووانە ◌ به طور بی‌شمار

**incalescence** /ˌɪnkəˈlesəns/ *noun*
کڵپەکردن، داگیرسان، هەڵبوون ◌ اتقاد

**incalescent** /ˌɪnkəˈlesənt/ *adjective*
هەڵبوو، کڵپەکردوو، داگیرساو ◌ متقد

**incandescence** /-sns/ *noun*
سپی‌بوونەوە (لەبەر گەرمای زۆر)، کڵپەکردن، کڵپنی، داگیرسان، هەڵبوون، سووربوونەوە (بە گەرمی) ◌ التهاب

**incandescent** /ˌɪnkænˈdesnt/ *adjective*
1 سپی‌یەوەبوو، کڵپەکردوو، کڵپن، داگیرساو، هەڵبوو، سوورەوەبوو، (تافەرمی، یەکجار) رق‌هەستاو، تووڕە 2 بریقەدار، بریسکەدار، درەوشاوە ◌ 1 گداخته، ملتهب، برافروخته، عصبانی 2 درخشان

**incandescent lamp** *noun*
گڵۆپی هەڵبوو یان سوورەوەبوو، گڵۆپی ئاسایی ◌ لامپ رشته‌ای

**incandescently** /ˌɪnkænˈdesntli/ *adverb*
بە شێوەیەکی سوورەوەبوو، سوورەوەبووانە ◌ به طور گداخته

**incantation** /ˌɪnkænˈteɪʃn/ *noun*
تەلەسم، ئەفسوون، جادوو، نووشتە، دێوبەند، ویرد (*incantatory adj* :*incantational adj*) ◌ افسون، سحر، ورد، طلسم

**incapability** /ɪnˌkeɪpəˈbɪləti/ *noun*
1 هیچ‌لەدەس‌نەهاتوویی، لەدەس‌نەهاتوویی، (هیچ)پێنەکراوی، دەسەوسانی، بێ‌دەسەڵاتی، بەیدەسی، داماوی، پەککەوتوویی، نەتوانی 2 لێنەوەشاوەیی، لێنەهاتوویی ◌ 1 عجز، ناتوانی 2 عدم صلاحیت

**incapable** /ɪnˈkeɪpəbl/ *adjective*
1 هیچ‌لەدەس‌نەهاتوو، لەدەس‌نەهاتوو، بەیدەس، (هیچ)پێنەکراو، دەسەوسان، بێ‌دەسەڵات، داماو، پەککەوتوو، بێکارە، نەتوان: *incapable of speech* 2 لێنەوەشاوە، لێنەهاتوو (*incapably* /ɪnˈkeɪpəbli/ *adv*: لێنەوەشاوانە، لێنەهاتووانە) ◌ 1 عاجز، ناتوان 2 فاقد صلاحیت

**incapacitation** /ˌɪnkəˌpæsɪˈteɪʃn/ *noun*
لاوازکردن، لەپەل‌وپۆخستن، پەکخستن، لەکارخستن، داوەشاندن، لەتوانایی‌خستن، لە هێزخستن، تەکان‌لێ‌برین ◌ تضعیف

**incapacity** /ˌɪnkəˈpæsəti/ *noun, pl.* incapacities
1 (هیچ)لەدەس‌نەهاتوویی، (هیچ)پێنەکراویی، دەسەوسانی، بێ‌دەسەڵاتی، بەیدەسی، پەککەوتوویی، نەتوانی 2 لێنەوەشاوەیی.

لێنەهاتوویی ۞ 1 ناتوانی، عجز 2 عدم صلاحیت

**incarceration** /ɪnˌkɑːsəˈreɪʃn, US -ˌkɑːrs-/ *noun*
زیندان، گرتووخانە، بەندیخانە ۞ زندان

**incarcerator** *noun*
لەزینداننەر ۞ زندانی کنندە

**incarnadine** /ɪnˈkɑːnədʌɪn/ *noun*
(ویژەیی) ڕەنگی سووری مەیلەو پەمەیی یان زەرشکی گەش، ئاڵ ۞ رنگ زرشکی کم‌رنگ

**incarnate** /ɪnˈkɑːnət, US -ˈkɑːrn-/ *adjective*
تەندار، نموونەی، هێمای، نیشانەی: *capitalism incarnate* ۞ مجسم، مظهر

**incarnation** /ˌɪnkɑːˈneɪʃn, US -kɑːrˈn-/ *noun*
1 گیانبەبەرداکردن، تەندارکردن، لەشدارکردن، شێوەی مرۆڤ پێدان، تەنداربوون، لەشگیری، تەنگیری 2 وێناکردن، هێنانەبەرچاو 3 نموونە: (Incarnation) 4 *the incarnation of evil* هاتنی خودا بۆ سەر عەرز بە شێوەی عیسا ۞ 1 تجسید، تجسد 2 تجسم 3 مظهر 4 (با I) انکارناسیون

**incaution** /ɪnˈkɔːʃn/ *noun*
گوێ‌پێنەدان، هەڵەشەیی، سەرەڕۆیی، سەرچڵی، کەمتەرخەمی، ناهۆشیاری، heedlessness ۞ بی‌توجهی، بی‌احتیاطی

**incautious** /ɪnˈkɔːʃəs/ *adjective*
کەمتەرخەم، ناهۆشیار، سەرچڵ، هەڵەشە، بەپەلە، بەپرتاو، سەرەڕۆ: *an incautious remark* (incautiously *adv*: ناهۆشیارانە، لە ڕووی هەڵەشەیی(یەوە)، هەڵەشانە، سەرەڕۆیانە) ۞ بی‌توجه، نسنجیده، شتابزده

**incautiousness** /ɪnˈkɔːʃəsnəs/ *noun*
گوێ‌پێنەدان، هەڵەشەیی، سەرچڵی، سەرەڕۆیی، کەمتەرخەمی، ناهۆشیاری، سەرپێوەنان، بیرلێنەکردنەوە، پەلەکردن ۞ بی‌احتیاطی، نسنجیدگی

**incendiarism** /ɪnˈsendiərɪzəm/ *noun*
1 ئاژاوەنانەوە، دووبەرەکی‌نانەوە، هەڵسوکەوتی ئاژاوەنەرەوانە 2 ئاورتێبەردان، سووتاندن ۞ 1 فتنه‌انگیزی، رفتار فتنه‌انگیزانه 2 آتش‌افروزی

**incendiary** /ɪnˈsendiəri, US -dieri/ *adjective, noun* (*pl.* incendiaries)
1 *adj* ئاژاوەنەرەوە، پشێوی‌نەرەوە، agitator 2 ئاورتێبەردەر، سووتێنەر *n* بۆمبی ئاگرین ۞ 1 *adj* فتنه‌انگیز 2 آتش‌انگیز *n* بمب آتش‌زا

**incense** /ˈɪnsens/ *noun*
1 بخور 2 ڕیاییبازی، زمانلووسی، flattery ۞ 1 بخور 2 تملق

**incense cedar** *noun*
ئارەوەن یا سیدری بخور، دارێکی درێژی سنەوبەری، لە خێزانی cypress [*Calocedrus decurrens syn. Libocedrus decurrens*] ۞ نوعی درخت

**incensed** /ɪnˈsenst/ *adjective*
ڕقهەستاو، تووڕە، غەیدی: - *They were incensed at the decision* ۞ خشمگین، عصبانی

**incensement** *noun*
تووڕەیی، ڕقهەستاندن، تووڕەکردن ۞ خشم، خشمگین‌سازی

**incensory** /ˈɪnsens(ə)ri/ *noun*, also censer, *pl.* incensories
بخوردان، وشەیێکی تر بۆ censer ۞ مجمر

**incentive** /ɪnˈsentɪv/ *adjective, noun*
بزوێنەر، هاندەر، گوڕپێدەر، گوڕ، تین، دڵگەرمی ۞ محرک، انگیزه، اشتیاق

**inception** /ɪnˈsepʃn/ *noun*
دەسپێک، سەرەتا، بەرایی، دەس‌پێکردن، commencement (بنەڕەت: لە *inceptio(n-)* لاتین، لە *incipere* "دەس‌پێکردن") ۞ شروع، آغاز

**inceptive** /ɪnˈseptɪv/ *adjective, noun*
1 *adj* سەرەتایی، initial ،beginning 2 (ڕێزمان) سەرەتادەربڕ *n* کاری سەرەتادەربڕ (inceptively *adv*) ۞ 1 *adj* ابتدایی 2 انسپتیو *n* فعل انسپتیو

**inceptive verb** *noun*
کاری سەرەتادەربڕ ۞ فعل انسپتیو

**inceration** *noun*
(بە)مۆمبوون ۞ تشمع

**incertitude** /ɪnˈsɜːtɪtjuːd/ *noun*
گومان، شک، دوودڵی، دڕدۆنگی، دڵنیانەبوون، نامەعلوومی، ناڕوونی، نەڕوونی، uncertainty، doubt ،doubtfulness ۞ شک، تردیدی، نامعلومی

**incessancy** /ɪnˈsesnsi/ *noun*
یەکبینەیی، بەردەوامی، هەمیشەیی، یەک‌لەدوای‌یەک‌بوون، بێ‌پسانەوەیی ۞ پیوستگی، دوام

**incessant** /ɪnˈsesnt/ *adjective*
یەکبینە، بەردەوام، هەمیشە، بێ‌پسانەوە، لەسەریەک، یەک‌لەدوای‌یەک، بێ پچڕان یان پسان :continual ،unceasing *an incessant noise* (incessantly *adv*: یەکبینە، بەبەردەوامی، لەسەریەک، هەمیشە، پەیتاپەیتا، بێ‌پسانەوە: *to talk -ntly*; incessantness *n*) ۞ پیوسته، مدام

**incest** /ˈɪnsest/ *noun*
زینا لەگەڵ بەربەنەدبووەکاندا (بنەڕەت: لە *incestus* ،*incestum* لاتین "unchastity"، لە -*in* "نا" + *castus* "پاک"، "chaste") ۞ زنای با محارم

**incest taboo** *noun*
نەهێشتن یا بەرگیری زینا لەگەڵ بەربەندبووەکان یان کەسانی قەدەخەکراو ۞ منع زنای با محارم

**incestuous** /ɪn'sestjuəs, US -tʃuəs/ *adjective*
1 زیناکردوو لەلەگەڵ بەریەندبووەکان 2 (کۆمەڵ) داخراو ◌ 1 مرتکب زنای با محارم 2 بسته

**incestuously** /ɪn'sestjuəsli, US -tʃuəsli/ *adv*

**incestuousness** /ɪn'sestjuəsnəs, US -tʃuəsnəs/ *noun*
زینا لەگەڵ بەریەندبووەکاندا ◌ زنای با محارم

**inch**[1] /ɪntʃ/ *noun*
1 ئینچ (یەکەی درێژایی بەرامبەر بە 2/54 سانتیمیتر یان دوازدەیەکی پێ یا فووت): *1.14* *She's a few inches taller than me* ◊ *inches of rain fell last night* 2 بڕێ، کەموسکە: *He escaped death by an inch* 3 بارستایی باران یا بەفر بە ئەندازەی ئینچێ یا دووقامک 4 (inches) بالا، بەژن، ◌ height ,stature 1 اینچ 2 یک ذره 3 اینچ 4 (در جمع) قامت

**inch**[2] /ɪntʃ/ *noun*
(سکاتلەند، لە ناوی جێگاکاندا) دوورگەی چکۆلە) ◌ جزیره

**-in-chief** /'ɪntʃiːf/ *adjective*
(لە لێکدانا) *commander-in-chief* :supreme ◌ (در ترکیب) supreme

**inchmeal** /'ɪntʃmiːl/ *adverb*
بەرەبەرە، کەمکەم، وردەوردە، little ,gradually by little ◌ تدریجاً

**inchoate** /ɪn'kəʊət, 'ɪnkəʊeɪt, US -'koʊ-/ *adjective*
تازەدەسپێکراو، ناپێشکەوتوو، ساوا، سەرەتایی، تەواودانەڕێژراو، هەڵنەداو، بەرەنەسەندوو: *inchoate ideas* ◌ ابتدایی، رشدنکرده

**inchoation** /ɪnkəʊə'ɪʃn, US -'koʊə-/ *noun*
دەسپێک، سەرەتا ◌ شروع، آغاز

**inchoative** /ɪn'kəʊətɪv, US -'koʊə-/ *adjective, noun*
*adj* 1 تازەدەسپێکراو، سەرەتایی، initial: *the inchoative stages* 2 (ڕێزمان) سەرەتادەربڕ، سەرەتایی (بڕوانە ergative) *n* کاری سەرەتایی یا سەرەتادەربڕ ◌ *adj* 1 ابتدایی 2 آغازی *n* فعل آغازی

**inchworm** = North American term for looper

**incidence** /'ɪnsɪdəns/ *noun*
1 ڕوودان، قەومان 2 کەوتن 3 تەنینەوە، بڵاوبوونەوە، ڕادەی بڵاوبووەوە ◌ 1 وقوع 2 سقوط 3 برخورد، شیوع

**incident** /'ɪnsɪdənt/ *noun, adjective*
*n* 1 ڕووداو، بوویەر، قەوماو، قەومین، پێشهات، بەرکەوت: *One particular incident sticks in my mind* 2 پێکادان، تێکهەڵچوون، شەڕ: *a border/diplomatic incident* *adj* 1 بەشێ لە 2 پێویست 3 کەوتوو ◌ *n* 1 حادثه، اتفاق 2 درگیری *adj* 1 جزو 2 لازم 3 ساقط

**incidental** /ˌɪnsɪ'dentl/ *adjective, noun*
*adj* 1 کەم، چکۆلە، لاوەکی، ناسەرەکی، ناگرنگ، تێهەڵکێش، ڕێکەوتی، شانسی: *The discovery was -tal to their main research* 2 بەشێ لە *n* وردەکاری، خەرج، ڕووداو و هتد لاوەکی، وردەخەرج، وردەشتەکان ◌ *adj* 1 جزئی، فرعی، غیرمهم، اتفاقی 2 جزو *n* انسیدنتال، چیزهای فرعی

**incidentally** /ˌɪnsɪ'dentli/ *adverb*
بەپێی ڕێکەوت، بە ڕێکەوت، بە تێهەڵکێشی ◌ برحسب اتفاق

**incidental music** *noun*
موسیقای (بەکگرەوند یان زەمینەی) فیلم یان شانۆ ◌ موسیقی متن

**incident room** *noun*
دیو یان ژووری ڕووداو (= دیوێ لە وێستگەی پۆلیس کە لەوێدا لە ڕووداوەکان دەکۆڵنەوە) ◌ اتاق حادثه

**incineration** /ɪnˌsɪnə'reɪʃn/ *noun*
سووتاندن، کردنەخۆڵەمێش، کردنەقاقەناز، خۆڵەمێشاندن (بنەڕەت: -*incinerat* med. L. *incinerare* "کردنە خۆڵەمێش") ◌ عمل سوزاندن، ترمید

**incinerator** /ɪn'sɪnəreɪtə(r)/ *noun*
دەزگا یان کوورەی زبڵ سووتاندن، سووتێنە ◌ زباله‌سوز

**incipience** /ɪn'sɪpiəns/ *noun*, also **incipiency** /ɪn'sɪpiənsɪ/
سەرەتا، دەسپێک، تازەیی، بەرایی ◌ آغاز، ابتدا

**incipient** /ɪn'sɪpiənt/ *adjective*
سەرەتایی، تازە، دەسپێک: *an incipient solar system* ◊ *evidence of incipient racial tension* ◌ آغازین، ابتدایی

**incipiently** /ɪn'sɪpiəntli/ *adverb*
بە شێوەیێکی سەرەتایی یان دەسپێک ◌ به طور آغازین یا ابتدایی

**incipit** /'ɪnsɪpɪt/ *noun*
سەرەتا، دەسپێک، بەرایی، پێشەکی (بنەڕەت: لاتین، لێرەوە دەسپێدەکا "(here) begins") ◌ آغاز، مقدمه

**incision** /ɪn'sɪʒn/ *noun*
1 بڕین، بڕشت، بڕگە، notch ,cut 2 keenness ,incisiveness ◌ برش

**incisional** *adjective*
سەربە بڕین، بڕشتی، بڕگەیی ◌ وابسته به برش

**incisive** /ɪn'saɪsɪv/ *adjective*
1 بڕا، بڕندە، تیژ 2 ڕاستەوخۆ، توند، تیژ، بڕا، ئاشکرا، دیار، ڕۆشن: *incisive*

2 برنــده 1 ◇ *comments/criticism/analysis* قاطع، صريح

**incisively** /ɪn'saɪsɪvli/ *adverb*
به شێوەیەکی برا ◇ به طور قاطع

**incisiveness** /ɪn'saɪsɪvnəs/ *noun*
تیژی، برایی ◇ برندگی

**incisor** /ɪn'saɪzə(r)/ *noun*
ددانی پێشەوە، دانی پچڕ، ددانی برەڕ (بۆ برین یا پچڕین) ◇ دندان پیشین

**incisure** /ɪn'sɪʒə/ *noun,* also **incisura** /ˌɪnsɪ'ʒʊərə/, *pl.* --es or -rae /-riː/
بــرین، کــەلێن، کەلەبــەر، کــون، قەڵەشــت ◇ بریدگی، برش، شکاف

**incitement** /ɪn'saɪtmənt/ *noun*
1 هــان(دان)، وروژانــدن، دنــەدان، فیــتدان، تیندان، نوێل کردن، بزواندن 2 بزوێنەر، هاندەر ◇ 1 تحریک 2 محرک

**incitant** /ɪn'saɪtənt/ *adjective*
بزوێنەر، دنەدەر، هاندەر ◇ برانگیزاننده

**incitation** /ˌɪnsa'teɪʃn/ *noun*
بزواندن، هاندان، دنەدان ◇ تحریک، برانگیزش

**incitement** /ɪn'saɪtmənt/ *noun*
1 بزوانــدن، هاروژانــدن، هــاندان 2 بزوێنــەر، هاروژێنــەر، مایــەی بزوانــدن، هــاندەر ◇ 1 انگیزش 2 انگیزه

**incivility** /ˌɪnsə'vɪləti/ *noun, pl.* incivilities
1 بێ‌ڕەوشتی، بێ‌ئەدەبی، بێ‌نەزاکەتی، توندی 2 کردەوە یان کاری بێ‌ڕەوشتانە ◇ 1 بــی‌ادبــی 2 عمل بی‌ادبانه

**incivism** /'ɪnsɪvɪzəm/ *noun*
نانیشتمانپەروەری، ناوڵاتپارێزی ◇ اینسیویسم

**incl.** *abbreviation* 1 including 2 inclusive

**inclemency** /-ənsi/ *noun, pl.* inclemencies
ناخۆشی هــەوا، ناســازگاری، تووشــی، ناسـازی، ســەرما و سەغــڵەت، ســەختی ◇ شــــدت، نامســاعدی هوا

**inclement** /ɪn'klemənt/ *adjective*
ناخۆش، سارد، (ڕەشە)باهاتوو، تووش، سەخت، ســەرما و سەغــڵەتاوی، ناســازگار، ئاڵــۆز: ◇ (inclemently *adv*)*inclement weather* نامساعد

**inclinable** /ɪn'klaɪnəbl/ *adjective*
یاریدەدەر، یارمەتیدەر ◇ کمک‌کننده

**inclination** /ˌɪnklɪ'neɪʃn/ *noun*
1 داهاتنـــەوە، چەمانـــەوە، چەماندنـــەوە، نووشــتاندنەوە، داهێنانــەوە 2 مــەیل، ئــارەزوو، لاربوونەوە، داشکانەوە، چەسپان، ویــست: *She had neither the time nor the inclination to help them* 3 لێژی، خواری، سەرەوخواری، لاری 4 ئاست یا ڕادەی لێژی 5 پلە یا ئاستی لادان ◇ 1 انحنا، خمیدگی، خم کردن 2 گــرایش، رغبت 3 شیب 4 میزان شیب 5 درجه‌ی انحراف

**incline** /'ɪnklaɪn/ *noun*
لێژ، سەرەوخواری، ئاستی سەرەوخوار ◇ شیب، سطح شیب‌دار

**inclined** /ɪn'klaɪnd/ *adjective*
1 لار، خــوار، خــێس، خــێچ، لێــژ 2 مــەیلدار، بەمەیل، پێخۆش(بوو)، ئامادە، بەتوانا ◇ 1 مایل، سطح شیب‌دار 2 مایل، مستعد

**inclined plane** *noun*
ئاستی لێژ یان سەرەوخوار ◇ سطح شیب‌دار

**inclosure** /ɪn'kləʊʒə(r) = enclosure

**included** *adjective*
لەخۆگرتوو، تیابوو ◇ شامل‌شده

**including** /ɪn'kluːdɪŋ/ *preposition*
تێخراو، لەخۆگرتووی، داگری، تیابووی، تیایەتی، بریتی لە: *Six people were killed in the riot, including a policeman* ◇ توگذاشته، شامل

**inclusion** /ɪn'kluːʒn/ *noun*
1 تێخســتن، خــستنەنێو 2 لــەخۆگرتن، تیــابوون، لەگەڵدابوون، گرتنەوە، داگرتن، گرتنــەخۆ ◇ 1 وارد کردن 2 اشتمال، تضمن، شمول

**inclusive** /ɪn'kluːsɪv/ *adjective*
1 گــشتگرەوە، لــەخۆگرتووی، بەرکــەوتووی، داگری، تیابووی: *from Monday to Friday inclusive* 2 ســەرجەم، تێکــرا، تــا ئــاخری، تــا کۆتایی ◇ 1 جامع، شامل 2 کلی، تا پایان

**inclusively** /ɪn'kluːsɪvli/ *adverb*
گشتگرانە، بە شێوەیێ کــە هــەموو شــتێ لــەخۆ بگرێ ◇ به طور فراگیر

**inclusiveness** /ɪn'kluːsɪvnəs/ *noun*
لــەخۆگرتن، تیــابوون، گرتنــەوە، گرتنــەخۆ ◇ تضمن، شمول

**incogitant** /ˌɪnkɒdʒɪtənt/ *adjective*
ســەرچڵ، گــوێ‌پێنــەدەر، هەڵەشــە، بــێ‌خــەیاڵ، سەرەڕۆ ◇ بی‌توجه

**incognito** /ɪnkɒg'niːtəʊ, US ˌɪnkɑːg'niːtoʊ/ *adjective, adverb, noun* (*pl.* incognitos)
*adj* نەناس، ناشناس، خۆگۆڕیو: *an -ito visit* *adv* نەناســانە، ناشناســانە *n* ناســنامەی درۆ ◇ *adj* ناشناس *adv* به طور ناشناس *n* هویت کاذب

**incognizable** *adjective*
لێکەوەنــەکراو، نەناســراو، لەناســینەوەنەهاتوو، ناناسرێتەوە، لێک ناکرێتەوە ◇ غیرقابل تشخیص

**incognizant** /ɪn'kɒgnɪzənt/ *adjective*
نائاگادار، نازانێ، ئاگادار نییە: *incognizant of the danger* ◇ بی‌اطلاع

**incoherence** /-əns/ *noun*
پچڕپچڕبوون، لێــک تــرازاوی، یــەک‌نەگرتنــەوە، پێکەوەنەبەستراوی ◇ گسیختگی، عــدم انــسجام، ناپیوستگی

**incoherent** /ˌɪnkəʊˈhɪərənt, US ˌɪnkoʊˈhɪr-/ *adjective*
پچرپچـر، لێـك تـرازاو، يـەكنـەگرتوو، يەكنەگرەوە، سەريەكنەچوو، پێكەوەنەبەستراو، شـێواو، شـپرزە، نارێـكوپێـك، پـرشوبـڵاو، بەسـەريەكەوەنەبوو، ئاسـان و رێـمان، ◊ *an incoherent essay* :inconsistent ◌ گسيخته، فاقد انسجام، نايپوسته، آشفته ◊ *incoherent with grief*

**incoherently** /ˌɪnkəʊˈhɪərəntli, US ˌɪnkoʊˈhɪr-/ *adverb*
پچرپچرانە، بە شێوەيەكی پچرپچر ◌ به طور يا گسسته

**incohesion** *noun*
نارێـكوپێكـی، پـرشوبـڵاوی، ناهـاوگرتوويی، نايەكگيری، نايەكێتی (كۆمەڵايەتی) ◌ فقدان انسجام، عدم همبستگی

**incohesive** *adjective*
پێوەنەنووساو، پێوەنەلكاو، نەچەسپيو، نەچەسپ ◌ نچسب

**incombustibility** /ˌɪnkəmˌbʌstəˈbɪlɪtɪ/ *noun*
لەسووتاننەهاتوويی، نەسووتاوی ◌ غيرقابليت احتراق

**incombustible** /ˌɪnkəmˈbʌstəbl/ *adjective*
لەسووتاننەهاتوو، نەسووت(ـاو)، نەسووتێنراو ◌ غيرقابل احتراق

**incombustibly** /ˌɪnkəmˈbʌstəbli/ *adverb*
بە شێوەيەكی نەسووتاو، نەسووتاوانە ◌ به طور غيرقابل احتراق

**income** /ˈɪnkʌm, US -kəm/ *noun*
1 داهات، پارەچە، دەسكەوت، دەرامەت، ئاژار 2 هاتن ◌ 1 درآمد 2 آمدن

**incomer** /ˈɪnkʌmə(r)/ *noun*
ژوورەوەهـاتوو، كەسـی هـاتوو، كۆچـەر ◌ واردشونده، مهاجر

**income support** *noun*
(لە بريتانيا و لە لايەن حكومەتەوە بۆ كەسانێ كە بێداهاتن يان داهاتيان كەمە) بژيو(ی ژيان) ◌ مدد معاش

**income tax** *noun*
داهاتانە، باجی داهات يان دەرامەت ◌ ماليات بر درآمد

**incoming** /ˈɪnkʌmɪŋ/ *adjective, noun*
*adj* 1 لە هاتندا، خەريكە نزيك دەبێتەوە، لە نزيكبوونەوەدا: *the* ◊ *incoming flights* 2 *incoming calls/mail* ◊ *incoming tide* 3 ژوورەوەهـاتوو، هـاتوو، تازەهـاتوو *the incoming* :تازەهەڵبژێردراو، تازەهەڵبژاردە 4 *government/president/administration* تازەدانراو *n* (incomings) داهات، دەرامەت ◌ *adj* 1 در حال آمدن 2 وارد، تازەوارد 3 تازەانتخاب شده 4 تازه منصوب‌شده *n* (در جمع) درآمد

**incommensurability** /ˌɪnkəˌmenʃərəˈbɪlɪtɪ/ *noun*
لەپێوانـنـەهاتوويی، لەبەراوردنـەهاتوويی ◌ مقايسه‌ناپذيری

**incommensurable** /ˌɪnkəˈmenʃərəbl/ *adjective*
لەپێواننـەهاتوو، لەبەراوردنـەهاتوو، بێپێوانـەی هاوبـەش، پێـوەر يـان جيـاواز، ئەنـدازەی هاوبەشيان نەبێ ◌ مقايسه‌ناپذير

**incommensurably** /ˌɪnkəˈmenʃərəbli/ *adverb*
لەپێواننەهاتووانە ◌ به طور مقايسه‌ناپذير

**incommensurate** /ɪnkəˈmenʃərət/ *adjective*
1 ناتـەواو، كـەم 2 نـەگونجاو، لێنەوەشـاو، *a* :disproportionate ,inadequate *confidence incommensurate with their ability* ◌ 1 غيركافی 2 بی‌تناسب

**incommensurately** /ɪnkəˈmenʃərətli/ *adverb*
1 ناتەواوانە 2 نەگونجاوانە ◌ 1 به طور غيركافی 2 به طور بی‌تناسب

**incommensurateness** *noun*
1 ناتـەواوی، ناتـەواوبوون 2 نـەگونجاوی، لێنەوەشاوەيی ◌ 1 غيركافی بودن 2 بی‌تناسبی

**incommodious** /ˌɪnkəˈməʊdɪəs/ *adjective*
(جێگـا) چكۆلانـە، تـەنگ، نـاخۆش، تەنگەبـەر، تەسـك، جێگا نابێتەوە، نائاسـوودە: *could sleep in the most -ommodious places* ◌ نامناسب

**incommodiously** /ˌɪnkəˈməʊdɪəsli/ *adverb*
تەنگەبەرانە، بە شێوەيەكی تەنگ يان چكۆلە ◌ به طور نامناسب

**incommodiousness** /ˌɪnkəˈməʊdɪəsnəs/ *noun*
تـەنگی، چكۆلـەيی، تەنگەبـەری، تەنگەبـەربوون ◌ ناراحتی، نامناسب بودن

**incommodity** /ˌɪnkəˈmɒdɪtɪ/ *noun, pl.* incommodities
تەنگی، چكۆلەيی ◌ ناراحتی

**incommunicability** /ˌɪnkəˌmjuːnɪkəˈbɪlətɪ/ *noun,* also -nicableness
1 لـەوتننـەهاتوويی، لەراگەيانـدننـەهاتوويی، رانەگـەيێنراوی 2 لەگرتنەوەنـەهاتوويی، رانەگوێزراوی ◌ 1 ابلاغ‌ناپذيری، غيرقابليت بيان 2 غيرقابليت سرايت

**incommunicable** /ˌɪnkəˈmjuːnɪkəbl/ *adjective*

1 لـــەوتن‌نـــەهاتوو، نـــەوتراو، نـــاوتری، لەراگەیانــدن‌نـەهاتوو، لــە راگەیانــدن نایــێ، رانەگەیێنراو 2 لەگرتنەوەنەهاتوو، رانەگوێزراو، تەشەنەکردوو ◌ 1 ابلاغ‌ناپذیر، غیرقابل بیان 2 غیرقابل سرایت

**incommunicably** /ˌɪnkəˈmjuːnɪkəbli/ *adverb*

بە شێوەیەکی نەوتراو یان لەوتن‌نەهاتوو، بە شێوەیێ کە نەتوانی لە نێو خەڵکا رایگەیێنی ◌ بە طور غیرقابل بیان

**incommunicado** /ˌɪnkəˌmjuːnɪˈkɑːdəʊ, US -ˈkɑːdoʊ/ *adjective, adverb*

رێگای نیبە لەگەڵ کەس قسە بکا ◌ محروم از ارتباط با دیگران

**incommunicative** /ˌɪnkəˈmjuːnəkeɪtɪv/ *adjective*, also uncommunicative

مـــات، کـــەم‌قـــسە، کـــەم‌بێـــژ، بـــێ‌دەنـــگ، uncommunicative ◌ تودار

**incommunicativeness** /ˌɪnkəˈmjuːnəketɪvnəs/ *noun*

کەم‌قسەیی، کەم‌بێژی، بێ‌دەنگی ◌ توداری

**incommutability** /ɪnkəˈmjuːtəbɪlɪti/ *noun*

1 لــــەگۆڕان‌نــــەهاتوویی، نــــەگۆڕی 2 لەگۆڕینەوەنـەهاتوویی ◌ 1 تغییـرناپـذیری 2 غیرقابلیت معاوضه

**incommutable** /ˌɪnkəˈmjuːtəbl/ *adjective*

1 لــەگۆڕان‌نــەهاتوو، نــاگۆڕدری، نــەگۆڕ 2 لەگۆڕینەوەنــــەهاتوو، ناگۆڕدرێتــــەوە ◌ 1 تغییرناپذیر 2 غیرقابل معاوضه

**incommutably** /ˌɪnkəˈmjuːtəbli/ *adverb*

لـەگۆڕان‌نەهاتووانـە، نەگۆڕانـە، بـە شـێوەیەکی لەگۆڕینەوەنەهاتوو ◌ به طور غیرقابـل تغییـر یـا معاوضه

**incompact** /ˌɪnkəmˈpækt/ *adjective*

لێک‌بڵاو، پێکەوەنەچەسپیو، نەپەستراو، لێک‌جیا ◌ غیرفشرده

**incompactness** /ˌɪnkəmˈpæktnəs/ *noun*

لێک‌بڵاوی، پێکەوەنەچەسپیوی، لێک‌هەڵاوی، نەپەستراوی، لێک‌جیایی ◌ غیرفشردگی

**incomparability** /ɪnˌkɒmpərəˈbɪləti, US -ˌkɑːm-/ *noun*, also incomparableness

لەبەراوردنــــەهاتوویی، لـــەپێوان‌نــــەهاتوویی، لەهەڵـــسەنگاندن‌نـەهاتوویی، هەڵنەسـەنگێنراوی، بێ‌هاوتایی، بێ‌وێنەیی ◌ غیرقابلیت مقایسه

**incomparable** /ɪnˈkɒmprəbl, US -ˈkɑːm-/ *adjective*

لەبەراوردنــــەهاتوو، بـــــەراورد نـــــاکری، لەپێوان‌نەهاتوو، ناپێوری، لەهەڵسەنگاندن‌نەهاتوو، هەڵناسـەنگێنری، هەڵنەسـەنگێنراو، بـێ‌هاوتـا، بێ‌وێنە: *the -comparable beauty of Lake Garda* ◌ غیرقابل مقایسه

**incomparably** /ɪnˈkɒmprəbli, US -ˈkɑːm-/ *adverb*

بێ‌هاوتایانە، لەبەراوردنەهاتووانە، بە شێوەیەکی بێ‌وێنە: *Her latest book is -bly better than her earlier ones* ◌ به طور غیرقابل مقایسه

**incompatibility** /ˌɪnkəmˌpætəˈbɪləti/ *noun*, also incompatibleness

نەســازاوی، نەســازی، نــەگونجاوی، نەســازان، یــەک‌نــەگرتن، یــەک‌نەکــەوتن، رێــک‌نەکــەوتن، دژایەتی، جیاوازی ◌ ناسازگاری، منافات

**incompatible** /ˌɪnkəmˈpætəbl/ *adjective*

نەســازاو، نەســاز، نــەگونجاو، یــەک‌نەکــەوتوو، پێکەوەهەڵــــنەکردوو، یــــەک‌نــــەگرەوە، رێک‌نەکەوتوو، دژ، جیاواز ◌ ناسازگار، مغایر

**incompatibly** /ˌɪnkəmˈpætəbli/ *adverb*

نەسازاوانە، بە شێوەیەکی نەگونجاو ◌ بـە طـور ناسازگار

**incompetence** /ɪnˈkɒmpɪtəns, US -ˈkɑːm-/ *noun*

لێنەوەشـــاوەیی، نەشـــیاوی، لێنــــەهاتوویی، بـێ‌ئیـدارەیی، بەکارنـەهاتوویی: *professional incompetence* ◌ عدم صلاحیت، بی‌لیاقتی

**incompetent** /ɪnˈkɒmpɪtənt, US -ˈkɑːm-/ *adjective, noun*

*adj* لێنەوەشـاوە، نەشـیاو، لێنـەهاتوو، بێ‌ئیـدارە، بەکارنەهاتوو، کۆڵ، پێکارە: *his incompetent handling of the affair* *n* مرۆی لێنەوەشاو یـان بەکارنـەهاتوو ◌ *adj* فاقـد صـلاحیت، بی‌کفایت *n* آدم فاقد صلاحیت

**incompetently** /ɪnˈkɒmpɪtəntli, US -ˈkɑːm-/ *adverb*

بەکارنەهاتووانە، بە شێوەیەکی پێکارە ◌ بە طور بی‌کفایت

**incomplete** /ˌɪnkəmˈpliːt/ *adjective*

ناتـەواو، نیـوەچڵ، ناپوختـە، کـەم‌وکـورت، گەنـد، نیمچـە، کـەمی هەیـە: *an incomplete set of figures* ◌ ناتمام، ناقص

**incomplete belief** *noun*

باوەڕی ناتەواو یان نیوەچڵ ◌ عقیدەی ناقص

**incomplete induction** *noun*

ئیندکشنی ناتەواو یان نیوەچڵ ◌ استقراء ناقص

**incompletely** /ˌɪnkəmˈpliːtli/ *adverb*

ناتەواوانـە، نیوەچڵانـە، نیـوەچڵ، بـە شـێوەیێکی نیـوەچڵ یـا ناپوختـە: *The causes of the phenomenon are still incompletely understood* ◌ به طور ناقص

**incompleteness** /ˌɪnkəmˈpliːtnəs/ *noun*

ناتـەواوی، نیوەچـڵی، ناپوختی، کـەم‌وکـوڕی ◌ نقص، ناتمامی

**incompletion** /ˌɪnkəmˈpliːʃn/ *noun*

1 ناتەواوی، نیوەچڵی، ناپوختی، کـەم‌وکوڕی 2

تەواونەبوویی، ڕانەپەڕیوی، جێبەجێ نەبوویی ◌ 1 نقص، ناتمامی 2 تکمیل نشدگی

**incomplex** *adjective*
سادە، ئاسان، ساکار، نادژوار، ناپێچەڵاوپێچ، ناتاڵۆز ◌ سادە، غیربغرنج

**incompliance** /ˌɪnkəmˈplaɪəns/ *noun*
مل نەدان، خۆبەدەستەوەنەدان، مل دانەنەواندن، پەسەندنەکردن، کەللەڕەقی، ڕێک نەکەوتن، سەرسەختی، قایل نەبوون ◌ عدم توافق، عدم قبول

**incompliant** /ˌɪnkəmˈplaɪənt/ *adjective*
مل نەدەر، ڕێک نەکەوتوو، نارازی، سەرسەخت، کەللەڕەق، قایل نەبوو، خۆبەدەستەوەنەدەر ◌ ناموافق، قبول نکننده

**incomposite** *adjective*
سادە، ساکار ◌ سادە

**incomprehensibility**
/ɪnˌkɒmprɪˌhensəˈbɪləti, US -ˌkɑːm-/ *noun*
لێ تێنەگەیشتوویی، لەتێگەیشتن نەهاتوویی، گرانی، سەرەندەرنەکراوی ◌ نامفهومی، غیرقابلیت درک

**incomprehensible** /ɪnˌkɒmprɪˈhensəbl, US -ˌkɑːm-/ *adjective*
لێ تێنەگەیشتوو، لەتێگەیشتن نەهاتوو، سەرەندەری ناکرێ، گران، سەخت، دژوار، ناڕوشن، سەرەندەرنەکراو، لێ حاڵی نەبوو ◌ نامفهوم، غیرقابل درک

**incomprehensibly** /-səbli/ *adverb*
لێ تێنەگەیشتووانە ◌ بە طور نامفهوم

**incomprehension** /ɪnˌkɒmprɪˈhenʃn, US -ˌkɑːm-/ *noun*
(لێ)تێنەگەیشتن، لێ حاڵی نەبوون ◌ عدم درک

**incomprehensive** /ˌɪnkəmprɪˈhenʃɪv/ *adjective*
ناگشتگر، گشتنەگر، ناگشتگیر، گشتنەگیر، کورت ◌ غیرجامع

**incomprehensively** /ˌɪnkəmprɪˈhenʃɪvli/ *adverb*
گشتنەگرانە، گشتنەگیرانە، بە شێوەیەکی گشتنەگر ◌ بە طور غیرجامع

**incompressibility** *noun*
لەپەستاوتن نەهاتوویی، پتەوی، نەپەستێوراوی ◌ تراکم ناپذیری

**incompressible** /ˌɪnkəmˈpresəbl/ *adjective*
لەپەستاوتن نەهاتوو، پتەو، نەپەستێوراو، نەپەسوواو، چکۆلەوەنەبوو، چکۆلە ناکرێتەوە، ناپەستێورێ ◌ تراکم ناپذیر

**incompressibly** /ˌɪnkəmˈpresəbli/ *adverb*
پتەوانە، بە شێوەیەکی لەپەستاوتن نەهاتوو ◌ بە طور تراکم ناپذیر

**imcomputable** /ˌɪnkəmˈpjuːtəbl/ *adjective*
بێ ئەژمار، لەژماردن نەهاتوو، حیساب نەکراو ◌ غیرقابل حساب

**inconceivability** /ˌɪnkənsiːvəˈbɪlɪtɪ/ *noun*
باوەڕپێنەکراوی، لەباوەڕنەهاتوویی، سەیربوون، بەبیردانەهاتوویی، لەبەرچاونەهاتوویی ◌ غیرقابلیت تصور

**inconceivable** /ˌɪnkənˈsiːvəbl/ *adjective*
بەبیردانەهاتوو، باوەڕپێنەکراو، لەباوەڕنەهاتوو، باوەڕی پێ ناکرێ، سەیر، لەخەیاڵ نەهاتوو، لەبەرچاونەهاتوو، ناێتە بەرچاو، نەکرد، ڕێ تێنەچوو، ناشێ، نابێ، unbelievable ◌ غیرقابل تصور، محال

**inconceivably** /ˌɪnkənˈsiːvəbli/ *adverb*
*She was -eivably wealthy* : باوەڕپێنەکراوانە ◌ بە طور غیرقابل تصور

**inconclusive** /ˌɪnkənˈkluːsɪv/ *adjective*
ناتەواو، نیوەچڵ، نابڕا، کۆتایی پێنەهاتوو، نابڕیاردەر، یەکلایی نەکراوە، یەکلایی نەبۆتەوە، بێ ئەنجام (تایەکلایی کەرەوە): *inconclusive* ◌ *an inconclusive argument* ◊ *evidence* ناکافی، غیرقطعی، بدون نتیجه

**inconclusively** /ˌɪnkənˈkluːsɪvli/ *adverb*
نایەکلاییکەرەوانە، بە شێوەیەکی بێ ئەنجام ◌ بە طور غیرقطعی

**inconclusiveness** /ˌɪnkənˈkluːsɪvnəs/ *noun*
کۆتایی پێنەهاتوویی، بێ ئەنجامی، یەکلایی نەبوونەوە ◌ عدم قطعیت

**incondensability** /ɪnkəndensəˈbɪlɪtɪ/ *noun*
چڕەوەنەبوویی، لەچڕی نەهاتوویی ◌ چگالی ناپذیری

**incondensable** /ˌɪnkənˈdensəbl/ *adjective*
چڕەوەنەبوو، لەچڕی نەهاتوو ◌ چگالی ناپذیر

**inconformity** /ˌɪnkəˈfɔːmɪtɪ/ *noun*
یەک نەگرتنەوە، ناکۆکی ◌ عدم مطابقت

**incongruity** /ˌɪnkɒnˈgruːəti, US ˌɪnkɑːn-/ *noun*, also incongruence
نەگونجاوی، نەسازاوی، ڕێک نەکەوتوویی، ناجۆری، ناکۆکی، یەک نەگرتنەوە، جیاوازی، یەک نەکەوتن، نابەرامبەری: *She was struck by the incongruity of the situation* ◌ عدم تناسب، ناهم‌خوانی، نابرابری

**incongruous** /ɪnˈkɒŋgruəs, US -ˈkɑːŋ-/ *adjective*, also incongruent
1 نەگونجاو، نەسازاو، ڕێک نەکەوتوو، ناکۆک، یەک نەگرەوە، یەک نەکەوتوو، ناکۆک، جیاواز، ناچوونیەک، نایەکجۆر، ناجۆر 2 بێجێ ◌ 1 ناسازگار، ناهماهنگ، متباین، ناهمگن 2 بی مناسبت

**incongruously** /ɪnˈkɒŋgruəsli, US -ˈkɑːŋ-/ *adverb*

نەسازاوانە، بە شێوەیەکی نەگونجاو: *incongruously dressed* ◊ به طور ناسازگار

**incongruousness** /ɪn'kɒŋgruəsnəs, US -'kɑːŋ-/ *noun*
نەگونجاوی، نەسازان، ناکۆکی، لێکدووری، یەکنەگرتنەوە، جیاوازی، دژایەتی ◊ ناسازگاری، ناهم‌خوانی، تباین

**inconnu** /'ãkonuː, ˌãkɒ'n(j)uː/ *noun*
*pl.* (same) ١ کەس یان شتێکی نەناسراو 2 نەناسە: جۆرێ ماسی راوی ئاوی شیرین، پێوەندی بە سەلمون یان ماسی ئازادەوە هەیە [*Stenodus leucichthys*] ◊ 1 آدم یا چیز ناشناخته 2 نوعی ماهی

**inconsecutive** *adjective*
پچڕپچڕ، بێ‌پێوەندی، ناپێوەندی‌دار ◊ بی‌ارتباط

**inconsequence** /ɪn'kɒnsɪkwəns/ *noun*
نەبوونی پێوەندی لۆژیکی، پچڕپچڕبوون، پارچەپارچەبوون ◊ عدم ارتباط منطقی، گسیختگی

**inconsequent** /ɪn'kɒnsɪkwənt/ *adjective*
1 پچڕپچڕ، بێ‌پێوەندی، پێوەندی پێوەنەبوون، ناپێوەندیدار، نالۆژیکی، نازیرانە، شێواو، شپرزە 2 ناگرنگ، هیچەکە، ئایەخ ◊ 1 گسیخته، بدون ارتباط، غیرمنطقی، آشفته 2 کم‌اهمیت

**inconsequently** /ɪn'kɒnsɪkwəntli/ *adverb*
نالۆژیکانە، بە شێوەیەکی نالۆژیکی ◊ به طور غیرمنطقی

**inconsequential** /ɪnˌkɒnsɪ'kwenʃl, US -ˌkɑːn-/ *adjective*
نالۆژیکی، نازیرانە، بێجێ، ناگرنگ، هیچ، هیچەکە، ئایەخ، (illogical، unimportant -onsequentiality *n*) ◊ غیرمنطقی، بی‌اهمیت

**inconsequentially** /-ʃəli/ *adverb*
بە شێوەیەکی نازیرانە، نالۆژیکانە ◊ به طور نامعقول

**inconsiderable** /ˌɪnkən'sɪdrəbl/ *adjective*
بێ‌بایەخ، هیچ، ناگرنگ، چکۆلە، ئایەخ: *We have spent a not -rable amount of money on the project already* ◊ ناچیز، کم‌اهمیت

**inconsiderably** /ˌɪnkən'sɪdrəbli/ *adverb*
بێ‌بایەخانە، بە شێوەیەکی هیچ ◊ به طور ناچیز

**inconsiderate** /ˌɪnkən'sɪdərət/ *adjective*
کەمتەرخەم، گوێ‌پێنەدەر، گوێ‌نەبزواو، نادەربەست، بیری بەلایەوە نییە، بێ‌خەیاڵ، بێ‌بیر، هەڵەشە، سەرەڕۆ، سەرچڵ، heedless، thoughtless ◊ بی‌فکر، بی‌پروا

**inconsiderately** /ˌɪnkən'sɪdərətli/ *adverb*
کەمتەرخەمانە، سەرچڵانە ◊ از روی بی‌فکری

**inconsiderateness** /ˌɪnkən'sɪdərətnəs/ *noun*
کەمتەرخەمی، بێ‌فکری، گوێ‌پێنەدان، بێ‌خەیاڵی، بێ‌تێبینی، بێ‌بیری، هەڵەشەیی، سەرچڵی، سەرەڕۆیی ◊ بی‌فکری، بی‌ملاحظگی، بی‌پروایی

**inconsistency** /-ənsi/ *noun, pl.* -nsistencies
نەگونجاوی، نەسازاوی، یەکنەگرتنەوە، ناکۆکی، دژایەتی، دژبەیەکی ◊ ناسازگاری، ناهماهنگی، منافات، تضاد

**inconsistent** /ˌɪnkən'sɪstənt/ *adjective*
1 نەگونجاو، نەسازاو، یەکنەکەوتوو، ڕێکنەکەوتوو، لێکدوور، یەکنەگرەوە، دژبەیەک، ناکۆک، پێکدژ: *-istent statements* 2 وازی‌وازی، ڕاڕا، تاوتاو، نەیەکقسە ◊ 1 ناسازگار، ناهماهنگ، متضاد 2 دمدمی

**inconsistently** /ˌɪnkən'sɪstəntli/ *adverb*
یەکنەکەوتووانە، ڕێکنەکەوتووانە ◊ به طور ناهماهنگ

**inconsolable** /ˌɪnkən'səʊləbl, US -'soʊl-/ *adjective*
دڵخۆشی‌نەدراو، دڵپڕ، کۆڵیل، نارەحەت، کز، خەمبار ◊ تسلی‌ناپذیر، غمگین

**inconsolably** /-əbli/ *adverb*
دڵخۆشی‌نەدراوانە ◊ به طور تسلی‌ناپذیر

**inconsonance** /ɪn'kɒnsənəs/ *noun*
ڕێکنەکەوتن، نەگونجان، نەسازان، یەکنەگرتنەوە ◊ عدم توافق، تنافر

**inconsonant** /ɪn'kɒnsənət/ *adjective*
ڕێکنەکەوتوو، نەسازاو، یەکنەکەوتوو، نەگونجاو ◊ ناموافق، متنافر

**inconsonantly** /ɪn'kɒnsənətli/ *adverb*
ڕێکنەکەوتووانە، بە شێوەیەکی یەکنەکەوتوو ◊ به طور ناموافق

**inconspicuous** /ˌɪnkən'spɪkjuəs/ *adjective*
نادیار، نائاشکرا، نابەرچاو، شاراوە، چکۆلانە، سەرنج ڕاناکێشێ، سەرنج‌ڕانەکێش ◊ ناهویدا، نامشخص

**inconspicuously** /ˌɪnkən'spɪkjuəsli/ *adverb*
بە شێوەیەکی نادیار ◊ به طور نامشخص

**inconspicuousness** /ˌɪnkən'spɪkjuəsnəs/ *noun*
نادیاربوون، نابەرچاوبوون، نابەرچاوی ◊ نامشخص بودن

**inconstancy** /ɪn'kɒnstənsɪ, US -'kɑːn-/ *noun, pl.* inconstancies
1 ناجێگیری، لەقی، نەچەسپیوی، سەقامنەگرتوویی، بگۆڕی، خۆڕانەگری 2 بێوەفایی، بێ‌ئەمەکی 3 وازی‌وازی‌بوون، تاوتاوبوون، ڕاڕایی ◊ 1 بی‌ثباتی، ناپایداری 2 بی‌وفایی 3 دمدمی بودن

**inconstant** /ɪn'kɒnstənt, US -'kɑːn-/ *adjective*
1 ناجێگیر، لەق، نەچەسپیو، سەقامنەگرتوو، بگۆڕ، خۆڕانەگر 2 بێوەفا، بێ‌ئەمەک 3 ڕاڕا،

تاوتاو ◇ 1 بی‌ثبات، ناپایدار 2 بی‌وفا 3 دمدمی

**inconstantly** /ɪn'kɒnstəntli, US -'kɑ:n-/ *adverb*
بی‌وەفایانە، خۆڕانەگرانە ◇ بە طور ناپایدار

**inconsumable** /ˌɪnkən'su:məbl/ *adjective*
لەبەکارهێنان‌نەهاتوو، بەکارنەهێنراو، بەکار نایە ◇ غیرقابل مصرف

**incontestable** /ˌɪnkən'testəbl/ *adjective*
مشت‌ومڕنەویست، بێ‌ئەملاوئەولا، بێ‌چەندوچۆن، بەرچاو، دیار، مسۆگەر: *His claim to the land is -ntestable* ◇ غیرقابل بحث، مسلم

**incontestably** /-əbli/ *adverb*
مشت‌ومڕنەویستانە، بە شێوەیەکی دیار ◇ بە طور غیرقابل بحث

**incontinence** /ɪn'kɒntɪnəns, US -'kɑ:n/ *noun*
خۆڕانەگری، هەرزەیی، ناخودداری، بەخۆداکردن، خۆپێ‌ڕانەگیران (میز و پیسایی) ◇ عدم خویشتن‌داری، بی‌اختیاری

**incontinent** /-ənt/ *adjective*
خۆڕانەگر، هەرزە، ناخوددار، خۆپێ‌ڕانەگیراو. کەمەرشل، دەلەمیز، بەخۆداکردوو (میز و پیسایی) ◇ فاقد خویشتن‌داری، اینکونتینت

**incontinently** /ɪn'kɒntɪnəntli/ *adverb*
خۆڕانەگرانە، هەرزانە ◇ بدون خویشتن‌داری

**incontinuity** /ɪnˌkɒntə'nju:ɪti/ *noun*
پێکەوەنەبەستراوی، پێکەوەنەنووساوی، دابڕاوی، نابەردەوامی، پێکەوەنەلکاوی ◇ ناپیوستگی

**incontrollable** /ˌɪnkəntrəʊləbl/ *adjective*
کۆنتڕۆڵ‌نەکراو، مەهارنەکراو، لەمەهاربەدەر، لەمەهارنەهاتوو، لەکۆنتڕۆڵ‌نەهاتوو، ڕانەگیراو، دابین ناکرێ، دەس‌بەسەردانەگیراو. ◇ (incontrollably *adv*) uncontrollable غیرقابل کنترل

**incontrovertibillity** /ˌɪnkɒntrəˌvɜ:tə'bɪlɪti/ *noun*
مشت‌ومڕنەویستی، مشت‌ومڕهەڵنەگری، مسۆگەری ◇ غیرقابلیت بحث

**incontrovertible** /ˌɪnkɒntrə'vɜ:təbl, US ˌɪnkɑ:ntrə'vɜ:rt-/ *adjective*
مشت‌ومڕنەویست، مشت‌ومڕهەڵنەگر، مسۆگەر، بێ‌ئەملاوئەولا، بێ‌چەندوچۆن، بەدرۆ ناخرێتەوە، دیار ◇ غیرقابل بحث، مسلم

**incontrovertibly** /ˌɪnkɒntrə'vɜ:təbli. US ˌɪnkɑ:ntrə'vɜ:rt-/ *adverb*
بێ‌ئەملاوئەولا، مسۆگەرانە، مشت‌ومڕنەویستانە ◇ مسلما

**inconvenience** /ˌɪnkən'vi:niəns/ *noun*
ناڕەحەتی، مزاحیم‌بوون، دەردەسەری، سەرێشە ◇ مزاحمت، گرفتاری

**inconvenient** /ˌɪnkən'vi:niənt/ *adjective*
1 ناڕەحەت‌کەر، مزاحیم 2 ناڵەبار، ناخۆش، بێجێ، نابەجێ، نەگونجاو، inopportune: *an inconvenient time* ◇ 1 مزاحم 2 نامناسب

**inconveniently** /ˌɪnkən'vi:niəntli/ *adverb*
ناڵەبارانە، بە شێوەیەکی ناڵەبار ◇ بە طور نامناسب

**inconvertibility** /ˌɪnkɒntrəˌvɜ:tə'bɪlɪti/ *noun*
لەگۆڕینەوەنەهاتوویی، لەگۆڕین‌نەهاتوویی ◇ غیرقابلیت مبادلە، تبدیل‌ناپذیری

**inconvertible** /ˌɪnkɒntrə'vɜ:təbl/ *adjective*
لەگۆڕینەوەنەهاتوو، لەگۆڕین‌نەهاتوو، لە گۆڕین نایێ، ناگۆڕدرێتەوە ◇ غیرقابل مبادلە، تبدیل‌ناپذیر

**inconvertibly** /ˌɪnkɒntrə'vɜ:təbli/ *adverb*
بە شێوەیەکی لەگۆڕینەوەنەهاتوو، لەگۆڕین‌نەهاتووانە ◇ بە طور غیرقابل مبادلە یا تبدیل‌ناپذیر

**incoordination** /ɪnkəʊˌɔ:dɪ'neɪʃn, US ɪnkoʊˌɔ:rd-/ *noun*
ناڕێک‌وپێکی، ناڕێکی، نەبوونی ڕێک‌وپێکی ◇ بی‌انتظامی

**incorporate** /ɪn'kɔ:pəreɪt, US -'kɔ:rp-/ *adjective*
(کۆمپانی) تۆمارکراو، incorporated ◇ ثبت‌شده

**incorporated** /ɪn'kɔ:pəreɪtɪd, US -'kɔ:rp-/ *adjective*
1 یەک‌خراو، یەک‌پارچە، تێکەڵ‌کراو، یەک‌گرتوو، یەک‌کەوتوو 2 (کۆمپانی) تۆمارکراو ◇ 1 ملحق‌شدە، متحدشدە 2 ثبت‌شدە

**incorporation** /ɪnˌkɔ:pə'reɪʃn, US -ˌkɔ:rp-/ *noun*
1 یەک‌خستن، کردنەیەک، تێکەڵ‌کردن، لێک‌هەڵکێشان: *the -ation of foreign words into the language* 2 یەک‌گرتوویی، یەک‌گرتن، یەک‌کەوتوویی 3 دامەزراندن، پێکهێنان، بنیاتنان 4 لەخۆگرتن، گرتنەبەر، گرتنەوە، تیابوون ◇ 1 الحاق 2 اتحاد 3 تشکیل 4 شمول

**incorporator** *noun*
دامەزرێنەر، بنیاتنەر ◇ تشکیل‌دهندە

**incorporeal** /ˌɪnkɔ:'pɔ:riəl, US -kɔ:r'p-/ *adjective*
ناجەستەیی، ناڵەشی، نامادی، مانایی ◇ غیرجسمانی، غیرمادی

**incorporeality** *noun*
ناجەستەیێتی، ناڵەشێتی، نامادی‌بوون، مانایی‌بوون ◇ غیرجسمانیت، غیرمادیت

**incorporealy** *adverb*
نامادی‌یانە، بە شێوەیەکی نامادی ◇ بە طور غیرمادی

**incorporeity** /ˌɪnkɔ:pə'ri:ɪti/ *noun, pl.* incorporeities

نامـــادیتی، بـــێ‌جەســـتەیی، بـــوونی نامـــادی، مانـــایی‌بـــوون، نامـــاکیتی، نامـــادی‌بـــوون، immateriality ◌ تجرد

**incorrect** /ˌɪnkəˈrekt/ *adjective*
هەڵە، نادروست، شاش، ناڕاست، درۆ، ناحەز، ناشیرین، لێنەوەشاو، هەرزە، نەگونجاو: *an incorrect transcription* ◌ غلط، نادرست، زشت، ناشایست

**incorrectly** /ˌɪnkəˈrektli/ *adverb*
بە هەڵە، بە نادروستی، بە شێوەیێکی نادروست ◌ به غلط، به طور نادرست

**incorrectness** /ˌɪnkəˈrektməs/ *noun*
نادروستی، هەڵەیی، شاشی ◌ عدم صحت

**incorrigibility** /ɪnˌkɒrɪdʒəˈbɪlɪtɪ, US -ˌkɔːr-/ *noun*
چـــاک‌نـــەکراوی، راســـتەوەنەکراوی ◌ اصلاح‌ناپذیری

**incorrigible** /ɪnˈkɒrɪdʒəbl, US -ˈkɔːr-/ *adjective*
چاک‌نەکراو، راستەوەنەکراو، راست نابێتەوە، نایێتە سەر ڕێ، دروست‌نەبوو، خراپ: *You're incorrigible!* ◌ اصلاح‌ناپذیر

**incorrigibly** /ɪnˈkɒrɪdʒəbli, US -ˈkɔːr-/ *adverb*
بە شێوەیەکی چاک‌نەکراو یان راستەوەنەکراو ◌ به طور غیرقابل اصلاح

**incorruptibility** /ˌɪnkəˌrʌptəˈbɪləti/ *noun*
فەسادهەڵنەگری، خراپ‌نەکراوی، خراپ‌نەبوویی ◌ فسادناپذیری

**incorruptible** /ˌɪnkəˈrʌptəbl/ *adjective*
1 حەڵاڵ‌خۆر، فەسادهەڵنەگر، بەرتیل ناخوا، بەرتیل وەرناگرێ، خراپ‌نەبوو، خراپ‌نەکراو، خراپ ناکرێ، نارزێ 2 هەمیشەیی، نەمر، تیانەچوو ◌ 1 فسادناپذیر، فاسدنشدنی 2 ابدی

**incorruptibly** /ˌɪnkəˈrʌptəbli/ *adverb*
خراپ‌نەبووانە، بە شێوەیەکی خراپ‌نەبوو، خراپ‌نەکراوانە ◌ به طور فاسدنشدنی

**incorrupt** /ˌɪnkəˈrʌpt/ *adjective*, also incorrupted /ˌɪnkəˈrʌptəd/
1 خراپ‌نەبوو، نەرزیو، نەگەنیو، فەسادهەڵنەگر، بەرتیل ناخوا، بەرتیل‌نەخۆر، بەرتیل وەرناگرێ؛ بێ‌هەڵە؛ پاک، دروست، ساخ؛ upright (incorruptly *adv*) ◌ فاسدنشده، رشوەنگیر؛ بی‌عیب؛ سالم، درست‌کار

**incorruptness** /ˌɪnkəˈrʌptnəs/ *noun*
خراپ‌نەبوویی، خراپ‌نەبوون، نەرزیوی ◌ فاسدنشدگی

**increasable** /ɪŋˈkriːsəbl/ *adjective*
شیاوی زۆربوون، پەرەسێن، برەوسێن ◌ قابل افزایش

**increase** /ˈɪŋkriːs/ *noun*
زۆربوون، زیادبوون، پەرەسەندن، برەوسەندن، پەرەسە، پەرە، گەشە، هەڵدان؛ (بێ‌باو) propagation ◌ افزایش، رشد

**increasingly** /ɪnˈkriːsɪŋli/ *adverb*
روو لە زۆری، روو لە پەرە: *increasingly difficult* ◌ به طور افزاینده

**increate** /ˌɪnkriːˈeɪt/ *adjective*
دروس‌نەکراو، نەنافرێنراو، نەخوڵقێنراو، uncreated ◌ غیرمخلوق

**incredibility** /ɪnˌkredəˈbɪlɪtɪ/ *noun*
باوەڕپێنەکراوی، لەباوەڕبەدەری، سەیربوون ◌ ناباوری، شگفتی

**incredible** /ɪnˈkredəbl/ *adjective*
باوەڕپێنەکراو، باوەڕی پێ ناکرێ، سەیر، هەرەباش: *It seemed incredible that she had been there a week already* ◊ *an incredible amount of work* ◊ *an incredible story* ◌ باورنکردنی، شگفت

**incredibly** /ɪnˈkredəbli/ *adverb*
لە رادەبەدەر، بە شێوەیەکی باوەڕپێنەکراو، لەباوەڕبەدەرانە ◌ بیش از حد، به طور باورنکردنی

**incredulity** /ˌɪnkrəˈdjuːləti, US -ˈduː-/ *noun*
گومان، باوەڕپێ‌نەبوون، شک(هەبوون) ◌ شک

**incredulous** /ɪnˈkredjələs, US -dʒəl-/ *adjective*
بەگومان، درەنگ‌باوەڕکردوو، بێ‌باوەڕ، باوەڕپێ‌نەکردوو، باوەڕپێ‌نەکردووانە: *an incredulous stare* ◌ شکاک، منکر، شکاکانه

**incredulously** /ɪnˈkredjələsli, US -dʒəl-/ *adverb*
باوەڕپێ‌نەکردووانە، بێ‌باوەڕانە، لە رووی باوەڕپێ‌نەکردن: *He laughed incredulously* ◌ شکاکانه، از روی ناباوری

**increment** /ˈɪŋkrəmənt/ *noun*
1 سوود، بەهرە 2 زۆربوون، پەرەسەندن 3 پارەی زیادی، مووچەی زیادی، سەرکرێ، سەرمووچە ◌ 1 بهره 2 افزایش 3 اضافه‌حقوق

**incremental** /ˌɪŋkrəˈmentl/ *adjective*
روولەپەرە، روولەزۆری: *incremental costs* ◌ فزاینده

**incrementalism** *noun*
گۆڕان‌باوەڕی (پلەپلە یان بەرەبەرە) ◌ اینکرامنتالیسم

**incrementalistic** *adjective*
سەربە گۆڕان‌باوەڕی ◌ اینکرامنتالیستی

**incrementally** /-təli/ *adverb*
بە شێوەیەکی روولەزۆری ◌ به طور فزاینده

**incretion** /ɪnˈkriːʃn/ *noun*
نێوەدەردان، دەردان لە نێوەوە ◌ تراوش داخلی

**increminating** *adjective*

تاوانبارکەر، گوناهبالدەر ◯ متهم‌کننده
**incremination** /ɪnˌkrɪmɪˈneɪʃn/ *noun*
تاوانبارکردن، گوناهبارکردن، پێوەکردن ◯ متهم‌سازی
**increminatory** /ɪnˈkrɪmənətɔːrɪ/ *adjective*
تاوانبارکەر ◯ اتهام‌آمیز، اتهام‌برانگیز
**incrustation** /ˌɪnkrʌˈsteɪʃn/ *noun*
1 توێژاڵ، توێکڵ 2 رەقیتە، قرتماخە، کەپرۆکە ◯ 1 لایه، پوسته 2 کبره
**incubation** /ˌɪŋkjuˈbeɪʃn/ *noun*
1 لەسەر هێلکە کەوتن، خستنەنێو دەزگای جووجەهەڵێنانەوە، (بە)کڕکەوتن: *artificial incubation* 2 ماوەی دەرنەکەوتوویی، ماوەی نێوان تووشبوون لە نەخۆشی و دەرکەوتنی یەکەم نیشانە 3 ماوە یان قۆناخی پەرەسەندن، قۆناخی پێکهاتن 4 چاندنی میکرۆب ◯ 1 روی تخم‌نشینی 2 انکوباسیون 3 دوره‌ی شکل‌گیری 4 کشت میکروب
**incubator** /ˈɪŋkjubeɪtə(r)/ *noun*
1 دەزگای جووجەهەڵێنان، دەزگای هێلکەهەڵێنان 2 کەلوپەلی تایبەتی بۆ بەخێوکردن یان پەروەردەکردنی منداڵانی زووتر لە دایکبوو یان نەوەکام ◯ انکوباتور
**incubus** /ˈɪŋkjubəs/ *noun, pl.* incubi /-baɪ/
1 دێوێکی نێر کە باوەڕ وابووە لەگەڵ ژنانی خەوتوو نزیکی دەکا 2 مێردەزمە، سەنگ، مۆتەکە، nightmare ◯ 1 اینکیوبوس 2 کابوس
**incudal** *adjective*
(توێکاری) دەزگایی ◯ سندانی
**incudes** /ˈɪŋkjudiːz, US ɪnˈkjuːdiːz/ = incus
**inculcation** /ˌɪnkʌlˈkeɪʃn/ *noun*
داکوتاندن، خستنەمێشکەوە، گوێش کردن ◯ تلقین
**inculcator** *noun*
داکوتێنەر، گۆش‌کەر، لەمێشک‌خەر ◯ تلقین‌گر
**inculpable** *adjective*
پاک، بێ‌گوناه ◯ مبرا
**inculpation** /ˌɪnkʌlˈpeɪʃn/ *noun*
تاوانبارکردن، گوناهبارکردن ◯ متهم‌سازی
**inculturation** /ɪnˌkʌltʃəˈreɪʃ(ə)n/ = enculturation
**incumbency** /ɪnˈkʌmbənsɪ/ *noun, pl.* incumbencies
1 ئەرک، کار، لەسەربوون، بەرپرسایەتی 2 پێویستی ◯ 1 وظیفه، مسؤلیت 2 وجوب
**incumbent** /ɪnˈkʌmbənt/ *adjective, noun*
*adj* 1 پێویست، لەسەربوو، 2 obligatory ئێستا، هەنووکە *n* کاربەدەستی بەرپرس ◯ *adj* 1 واجب 2 حال *n* صاحب منصب
**incunabulum** /ˌɪnkjuˈnabjuləm/ *noun,*
**incunable** /ɪnˈkjuːnəb(ə)l/, *pl.* incunabula
کتێبی زوو چاپکراو، ب.ت. بەرلە 1501 ◯ اینکونابولوم
**incurability** /ɪnˌkjuərəˈbɪlətɪ, US -ˌkjur-/ *noun*
بێدەرمانی، لەدەرماننەهاتوویی، دەرماننەکراوی ◯ علاج‌ناپذیری
**incurable** /ɪnˈkjuərəbl, US -ˈkjur-/ *adjective, noun*
*adj* بێدەرمان، تیمارنەکراو، دەرماننەکراو، بێچارەسەر، لەدەرماننەهاتوو، چارەسەرنەکراو، بێدەرمان، چاکەوەنەبوو *n* نەخۆشی چاکەوەنەبوو ◯ *adj* علاج‌ناپذیر *n* بیمار لاعلاج
**incurably** /-əblɪ/ *adverb*
تیمارنەکراوانە، دەرماننەکراوانە، لەدەرماننەهاتووانە: *incurably ill/romantic* ◯ به طور علاج‌ناپذیری
**incuriosity** /ˌɪnkjurɪˈɒsɪtɪ/ *noun*
کەمتەرخەمی، بێخەیاڵی، گوێ‌پێنەدان ◯ بی‌اعتنایی
**incurious** /ɪnˈkjuərɪəs, US -ˈkjur-/ *adjective*
1 کەمتەرخەم، بێخەیاڵ، نادەربەست، لامسەرلا، گوێ‌پێنەدەر، بێ‌پرسیار 2 گوێ‌نەدەرانە ◯ 1 بی‌تفاوت 2 حاکی از بی‌تفاوتی
**incuriously** /ɪnˈkjuərɪəslɪ, US -ˈkjur-/ *adverb*
کەمتەرخەمانە، بە کەمتەرخەمییەوە ◯ با بی‌تفاوتی
**incuriousness** /ɪnˈkjuərɪəsnəs, US -ˈkjur-/ *noun*
کەمتەرخەمی، بێخەیاڵی، گوێ‌پێنەدان، نادەربەستی، لامسەرلایی، گوێ‌لێنەبوون، پشت‌گوێ‌خستن، بەتەنگەوەنەبوویی، بێ‌پرسیاری ◯ بی‌تفاوتی، بی‌اعتنایی، ناکنجکاوی
**incurrence** *noun*
بەرکەوتن، گرتنەبەر، داگرتن، گرتنەخۆ، لەخۆگرتن ◯ شمول
**incurrent** *adjective*
(زۆرتر گیانەوەرناسی، کون یان رەگێ) نێوەڕێژ، دەڕژێتە نێوەوە (دژی excurrent) ◯ اینکیورینت
**incursion** /ɪnˈkɜːʃn, US ɪnˈkɜːrʒn/ *noun*
1 هێرش، پەلامار، هەڵمەت، شاڵاو، هوروژم (کتوپڕ و کورت) 2 دەس‌درێژی ◯ 1 یورش، حمله 2 تجاوز
**incursive** /ɪnˈkɜːsɪv/ *adjective*
هێرش‌کەر، پەلاماردەر ◯ حمله‌کننده
**incurvate** /ɪnˈkəːvət/ *adjective*
چەمیو، چەماو، داچەماو (بۆ نێوەوە) ◯ خمیده (به سوی داخل)
**incurvation** /ˌɪnkɜːˈveɪʃn/ *noun*
چەمیوی، چەماوی، چەمانەوە ◯ خمیدگی

**incurved** *adjective*
چەماو (بۆ نێوەوە) ◌ خمیده

**incus** /ˈɪŋkəs/ *noun, pl.* incudes /ˈɪŋkjʊdi:z, ɪnˈkju:di:z/
(توێکاری، گوێ) ئێسکی دەزگایی: ئێسکێکی دەزگاتاسای anvil-shaped چکۆلەی نێو گوێی نێوەڕاست، لەڕەکان لە نێوان malleus و stapes ڕادەگوێزێ (بنەڕەت: لە لاتینەوە بە واتای "anvil") ◌ استخوان سندانی

**incuse** /ɪnˈkju:z/ *noun*
نەخشی چەکوشی ◌ نقش چکشی

**Ind** *abbreviation* Independent
1 (لە بریتانیا، سیاسەت) پاڵێوراو یان بەرەندامی سەربەخۆ 2 نوێنەری سەربەخۆ یان بێلایەن ◌ 1 کاندیدای منفرد 2 نمایندەی منفرد

**indebted** /ɪnˈdetɪd/ *adjective*
1 قەرزار، وامدار، قەرزلەسەر 2 (خوازە) قەرزار، دەیندار، منەتبار، قەرزاربار، وامدار: *I am deeply indebted to my family for all their help* ◌ 1 بدهکار 2 مدیون

**indebtedness** /ɪnˈdetɪdnəs/ *noun*
1 قەرزاری، وامداری 2 منەتباری، قەرزاری، منەت ◌ 1 بدهکاری 2 مدیون بودن

**indecency** /ɪnˈdi:snsi/ *noun, pl.* indecencies
هەرزەیی، ناشیرینی، بێشەرمی، لێنەوەشاوەیی، دەمپیسی، کار یان قسەی ناحەز ◌ ابتذال، زشتی، عمل زشت

**indecent** /ɪnˈdi:snt/ *adjective*
هەرزە، ناشیرین، بێشەرمانە، بێئابڕووانە، نانەجیمانە، بلەح، ناحەز، پیس، ناپەسند: *-decent conduct/photos* ◌ مبتذل، ناشایست، رکیک

**indecent assault** *noun*
(ماف) ئازاردانی سێکسی، سووکایەتی(پێکردنی) سێکسی، هێرش و ئازاری سێکسی ◌ اهانت جنسی

**indecent exposure** *noun*
(ماف) خۆدەرخستن ◌ عورت‌نمایی

**indecently** /ɪnˈdi:sntli/ *adverb*
بێشەرمانە، نانەجیمانە، بێئابڕووانە ◌ وقیحانه

**indeciduous** *adjective*
(ڕووەکناسی) نەوەریو، نەوەر، هەڵنەوەریو ◌ نریز

**indecipherable** /ˌɪndɪˈsaɪfrəbl/ *adjective*
سەرەندەرنەکراو، سەرلێدەرنەهێنراو، نەخوێنراو، سەرەندەری ناکرێ، کەس تێیناگا، لێتێنەگەیشتوو ◌ نامفهوم

**indecision** /ˌɪndɪˈsɪʒn/ *noun*
بێبڕیاری، بڕیارێنەدران، دوودڵی، تیاماوی ◌ بی‌تصمیمی، دودلی

**indecisive** /ˌɪndɪˈsaɪsɪv/ *adjective*
1 یەکلایینەکراوە، بڕیار(لەسەر)نەدراو، لایێبەلادانەخراو، کۆتاییپێنەهاتوو، شلەوەکردوو 2 بێئەنجام، هیچلێهەڵنەوەریو، بێبەرهەم، نەبڕاوە، دوودڵ، تیاماو، بڕیارێنەدراو، ڕاڕا، نادڵنیا ◌ 1 غیرقطعی 2 بی‌نتیجه، بی‌عزم، مردد

**indecisively** /ˌɪndɪˈsaɪsɪvli/ *adverb*
یەکلایینەکراوانە، بە شێوەیەکی یەکلایینەکراوە ◌ به طور غیرقطعی

**indecisiveness** /ˌɪndɪˈsaɪsɪvnəs/ *noun*
کۆتاییپێنەهاتوویی، یەکلایینەکراوەیی، نەبڕاوەیی، دوودڵی، تیاماوی، دڕدۆنگی ◌ عدم قطعیت، تردید

**indeclinable** /ˌɪndɪˈklaɪnəbl/ *adjective*
(ڕێزمان) لەگەردان‌نەهاتوو، گەردان‌نەکراو ◌ غیرقابل صرف

**indecomposable** /ˌɪndɪkəmˈpəʊzəbl/ *adjective*
لێکەوەنەبوو، لەهەڵوەشان‌نەهاتوو، هەڵنەوەشاو، لێک نابێتەوە ◌ تلاشی‌ناپذیر

**indecorous** /ɪnˈdekərəs/ *adjective*
دوور لە ڕەوشت، جوان نییە، ئابڕووبەرانە، عەیب، ناحەز، ناشیرین، لێنەوەشاو ◌ ناشایست، مبتذل

**indecorously** /ɪnˈdekərəsli/ *adverb*
بێڕەوشتانە، (بە شێوەیەکی) ناحەز ◌ بی‌ادبانه

**indecorousness** /ɪnˈdekərəsnəs/ *noun*
بێڕەوشتیی، ناشیرینی، ناحەزی، لێنەوەشاوەیی ◌ بی‌ادبی، ناشایستگی

**indecorum** /ˌɪndɪˈkɔ:rəm/ *noun*
بێڕەوشتی، بێئابڕوویی، ناحەز جووڵانەوە، ڕەفتار یان هەڵسوکەوتی ناشیرین ◌ بی‌ادبی، ابتذال، رفتار نامناسب

**indeed** /ɪnˈdi:d/ *adverb*
1 لە ڕاستیدا 2 بە ڕاستە، یانی ئاوا، حەتمەن ◌ 1 در واقع 2 جداً

**indefatigability** /ɪndɪˌfætɪgəˈbɪlɪti/ *noun*
ماندوویی‌نەناسی، بەچنگی، بەکاری، پڕتاقەتی، کارخۆری ◌ خستگی‌ناپذیری

**indefatigable** /ˌɪndɪˈfætɪgəbl/ *adjective*
1 ماندوویی‌نەناس، بەچنگ، بەکار، کارخۆر: *an -efatigable defender of human rights* 2 یەکبینە، بەردەوام ◌ 1 خستگی‌ناپذیر 2 لایتقطع

**indefatigably** /ˌɪndɪˈfætɪgəbli/ *adverb*
ماندوویی‌نەناسانە ◌ به طور خستگی‌ناپذیر

**indefeasibility** /ɪndɪˌfi:zəˈbɪlɪti/ *noun*
لەهەڵوەشانەوەنەهاتوویی، پووچەوەنەکراوی، سەقامگرتوویی ◌ غیرقابلیت الغا

**indefeasible** /ˌɪndɪˈfi:zəbl/ *adjective*
لەهەڵوەشانەوەنەهاتوو، هەڵنەوەشاو، هەڵناوەشێتەوە، بەتاڵ ناکرێتەوە، پووچەوەنەکراو، سەقامگرتوو: *The ◊ -defensible behaviour Prime Minister was accused of defending*

the -efensible ◊ غیرقابل فسخ

**indefeasibly** /ˌɪndɪˈfiːzəbli/ *adverb*

سەقامگرتووانە ◊ به طور غیرقابل فسخ

**indefectible** /ˌɪndɪˈfɛktɪb(ə)l/ *noun*

تەواو، رەبەق، کامڵ، ئازگار، ئایدیاڵ، زۆر باش، یەکجار خۆش، بێگەرد، بێخەوش، بێعەیب ◊ کامل، ایدهال، محض، تمام، بیعیب

**indefensibility** /ɪndɪˌfɛnsəˈbɪlɪtɪ/ *noun*

لەبەرگرینەهاتوویی، نەپارێزراوی، لەپاساونەهاتوویی، پاساونەدراوی ◊ دفاعناپذیری، غیرقابلیت توجیه

**indefensible** /ˌɪndɪˈfɛnsəbl/ *adjective*

لەبەرگرینەهاتوو، نەپارێزراو، ناپارێزرێ، لەپاساونەهاتوو، نەبەخشراو، پاساونەدراو ◊ دفاعناپذیر، غیرقابل توجیه

**indefensibly** /ˌɪndɪˈfɛnsəbli/ *adverb*

لەبەرگرینەهاتووانە، لەپاساونەهاتووانە، بە شێوەیێکی لەبەرگرینەهاتوو یان لەپاساونەهاتوو ◊ به طور دفاعناپذیر یا غیرقابل توجیه

**indefinable** /ˌɪndɪˈfaɪnəbl/ *adjective*

1 لەناسیننەهاتوو، پێناسەنەکراو، پێناسە ناکرێ، لەدەربڕیننەهاتوو، دەرنەبڕاو، روون ناکرێتەوە، نەوتراو: *an ◊ indefinable feelings* 2 ئاڵۆز، تەماوی *indefinable concept* (indefinably /-əbli/ *adv*: ئاڵۆزانە، بە شێوەیێکی تەماوی) ◊ 1 غیرقابل تعریف، غیرقابل بیان 2 بغرنج

**indefinite** /ɪnˈdɛfɪnət/ *adjective*

1 نادیار، تەماوی، تەژمە، ناڕۆشن، نەروون، imprecise: *an indefinite science*، دیارینەکراو، بێئەنداز، بێئەژمار، بێکۆتایی 2 (ڕێزمان) دەرنەخەر، نەناسراو (indefiniteness *n*: نادیاری، نەروونی، دیارینەکراوی) ◊ 1 نامشخص، نامعین، نامحدود 2 (دستور زبان) نکره

**indefinite article** *noun*

(ڕێزمان) ئامرازی نەناسراو، پیتە دەرنەخەر ◊ حرف نکره یا ناشناخته

**indefinite boundaries** *noun, pl.*

سنوورە دیارینەکراوەکان ◊ مرزهای نامشخص

**indefinite integral** *noun*

(بیرکاری) فانکشنی ئاڵۆز: فانکشنێ کە بەرهەمەکەی یان لێوەرگیراوەکەی هی فانکشنێکی تر بێ ◊ تابع مبهم

**indefinitely** /ɪnˈdɛfɪnətli/ *adverb*

نادیارانە، تەماوییانە، بە شێوەیێکی نادیار، تەژمانە ◊ به طور نامشخص

**indefinite pronoun** *noun*

(ڕێزمان) جێناوی نەناسراو، راناوی دیارینەکراو ◊ ضمیر نامعین

**indehiscence** /ˌɪndɪˈhɪs(ə)ns/ *noun*

نەکراوەیی، دانەتلیشاوی، دانەقلیشاوی ◊ ناگشایی

**indehiscent** /ˌɪndɪˈhɪs(ə)nt/ *adjective*

(ڕووەکناسی، کەلوو) نەکراوە، ناتلیشێتەوە، ناقلیشێتەوە، دانەتلیشاو، دانەقلیشاو: *indehiscent fruits* ◊ ناگشای

**indelibility** /ɪnˌdɛləˈbɪlɪtɪ/ *noun*

لەسڕینەوەنەهاتوویی، پاکەوەنەبوویی، لێوەنەبوویی، بواردوویی ◊ غیرقابلیت محو

**indelible** /ɪnˈdɛləbl/ *adjective*

1 لەسڕینەوەنەهاتوو، پاکەوەنەبوو، ناسڕێتەوە، لێوەنەبوو، بواردوو 2 لەبیرەوەنەچوو، لە بیر ناچێتەوە ◊ 1 غیرقابل محو 2 فراموشنشدنی

**indelibly** /-əbli/ *adverb*

لێوەنەبووانە، بە شێوەیەکی بواردوو ◊ بە طور پاکنشدنی

**indelicacy** /-kəsi/ *noun, pl.* indelicacies

بێڕەوشتی، بێشەرمی، بێئابڕوویی، قسەتڕنی ◊ بینزاکتی

**indelicate** /ɪnˈdɛlɪkət/ *adjective*

بێڕەوشت، بێشەرم، قسەتڕن، کەرتر، بێشەرمانە، ناحەزانە، عەیبانە، سووکانە: *an indelicate question* (indelicately *adv*: سووکانە، بێڕەوشتانە؛ indelicateness *n*) ◊ بینزاکت، بیادبانه

**in delicto** *noun*

(ماف) خەتابار ◊ متخلف

**indemnification** /ɪnˌdɛmnɪfɪˈkeɪʃn/ *noun*

1 دەستەبەری 2 بۆبژاردن، زیاندانەوە، قەرەبووکردنەوەی زیان و زەرەر، زیانە، تاوان ◊ 1 ضمانت 2 خسارت، غرامت

**indemnitee** /ɪnˌdɛmnɪˈtiː/ *noun*

بۆبژێردراو ◊ غرامتگیر

**indemnitor** *noun*

بۆبژێر ◊ غرامتپرداز

**indemnity** /ɪnˈdɛmnəti/ *noun, pl.* indemnities

1 دەستەبەری، بەڵێنیدان، گەرەنتی (بۆ زیان و زەرەر) 2 پاراستن 3 بۆبژاردن، زیاندانەوە 4 بەخشین، لێخۆشبوون، جەبە ◊ 1 تضمین 2 مصونیت 3 خسارت 4 معافیت

**indemonstrable** /ˌɪndɪˈmɒnstrəbl/ *adjective*

لەسەلماندننەهاتوو، نەسەلمێنراو (indemonstrably *adv*) ◊ غیرقابل اثبات

**indene** /ˈɪndiːn/ *noun, prob. a contr.* of indonaphthene

(کیمیا) هایدرۆکاربۆنی شلەی بێڕەنگ $C_9H_8$ لە قیر دەگیرێ و بۆ دروسکردنی جەوی دەسکرد بەکاردێترێ ◊ ایندن

**indent** /ˈɪndent/ *noun*

1 داوا، ڕاسپاردن 2 چوونەنێو، کشانەوە، مەودا (چۆڵایی سەرەتای دێڕی) 3 = indenture ◊

1 درخواست 2 تورفتگی

**indentation** /ˌɪndenˈteɪʃn/ *noun*

1 چوونەنێو، بەنێوداچوویی، کشانەوە، مەودا، قوپایی، قوپان 2 ددانە، کۆنگرە، برگە ◌ 1 تورفتگی 2 دندانە

**indented** /ɪnˈdentɪd/ *adjective*

ددانەددانە، گرنالگرنال، برگەبرگە ◌ دندانە دندانە، مضرس

**indenture** /ɪnˈdentʃə(r)/ *noun*

1 بریارنامەی دوودانەیی 2 بریارنامە، پەیماننامە 3 بریارنامەی شاگردی (کە تازەکار یان شاگرد دەیدا بە خاوەنکارەکەی) ◌ 1 قرارداد دونسخەای 2 قرارداد 3 ایندنتور

**independence** /ˌɪndɪˈpendəns/ *noun*

1 سەربەخۆیی، سەربەستی، خۆسەری، ئازادی، خۆبوون: *Cuba gained -ence from Spain in 1898* 2 پێوەنەبەستراوی، نەبەستراوی، ناپێوەبەندی، پشتپێنەبەستوویی، نیازپێنەبوون ◌ 1 استقلال، قیام بە ذات 2 عدم وابستگی

**Independence Day** *noun*

رۆژی سەربەخۆیی (چوارەمی ژوولای 1776 کە کۆلۆنییەکانی ئەمریکا سەربەخۆیی خۆیان لە بریتانیا راگەیاند) ◌ روز استقلال امریکا

**independency** *noun*

1 سەربەخۆیی 2 حکومەت یان ولاتی سەربەخۆ ◌ 1 استقلال 2 دولت یا کشور مستقل

**independent** /ˌɪndɪˈpendənt/ *adjective, noun*

*adj* 1 سەربەخۆ، خۆبوو، خۆسەر، سەربەست، ئازاد 2 پێوەنەبەستراو، جیا، جودا، نەبەستراو، پشتپێنەبەستوو، ناپێوەبەند، ناپێویست، نیازپێنەبوو 3 (مێژوویی) (independent) - *n* Congregational پالێوراو یان نوێنەری سەربەخۆ یاخو بێلایەن (independently *adv*: سەربەخۆیانە، خۆسەرانە، بە شێوەیەکی جیا) ◌ 1 *adj* مستقل، قائم بە ذات 2 بدون وابستگی *n* کاندیدا یا نمایندەی منفرد

**independent clause** *noun*

(ڕێزمان) رستۆکە یا برگەی سەرەکی، لارستەی سەربەخۆ ◌ بند پایە

**independent means** *noun, pl.*

داهاتی سەربەخۆ ◌ درآمد مستقل

**independent school** = private school

**in-depth** *adjective*

قووڵ، ورد، پەروەردەکاری، چڕوپڕ، تێروتەسەل، دوورودرێژ، comprehensive ،thorough: *an in-depth discussion* ◌ ژرف، دقیق، مفصل

**in-depth analysis** *noun*

شیکردنەوەی ورد ◌ تحلیل دقیق

**in-depth research** *noun*

توێژینەوەی ورد ◌ پژوهش دقیق

**in-depth study** *noun*

لێکۆڵینەوەی ورد، خوێندنەوەی ورد ◌ تحقیق دقیق، مطالعەی دقیق

**indescribability** /ˌɪndɪˌskraɪbəˈbɪlɪti/ *noun*

لەباس(کردن)نەهاتوویی، باسنەکراوی ◌ وصفناپذیری

**indescribable** /ˌɪndɪˈskraɪbəbl/ *adjective*

لەباس(کردن)نەهاتوو، باسنەکراو، باس ناکرێ ◌ وصفناپذیر

**indescribably** /-əbli/ *adverb*

بە شێوەیەکی باسنەکراو ◌ بە طور وصفناپذیر

**indestructibility** /ˌɪndɪˌstrʌktəˈbɪlɪti/ *noun*

تیانەچوویی، نەمری، لەنێونەچوویی ◌ فناناپذیری

**indestructible** /ˌɪndɪˈstrʌktəbl/ *adjective*

تیانەچوو، نەمر، لەنێونەچوو، تیاناچێ، نافەوتێ، تێکنەچوو، خراپنەبوو (indestructibly *adv*: تیانەچووانە، لەنێونەچووانە) ◌ فناناپذیر

**indeterminability** /ˌɪndɪtɜːmɪnəˈbɪləti/ *noun*

دیارینەکراوی ◌ تعیینناپذیری

**indeterminable** /ˌɪndɪˈtɜːmɪnəbl/ *adjective*

1 دیارینەکراو، نادیار 2 (ماف) چارەسەرنەکراو، لاێ بە لادانەخراو، بێئەنجام (indeterminably *adv*: بە شێوەیەکی نادیار) ◌ 1 تعییننا‌پذیر، نامشخص 2 غیرقابل حل

**indeterminacy** /-nəsi/ *noun*

1 یەکلایینەبوونەوە، کۆتاییپێنەهاتوویی، دیارینەکران، یەکلایینەکراوەیی 2 (بیرکاری) نادیاری ◌ 1 عدم قطعیت 2 ابهام

**indeterminate** /ˌɪndɪˈtɜːmɪnət, US -ˈtɜːrm-/ *adjective*

نادیار، روون نییە، دیارینەکراو، نامەعلووم، یەکلایینەکراو، بەلادانەخراو، نەبڕاوە، بڕیارلەسەرنەدراو، بێئەنجام (indeterminately *adv*: دیارینەکراوانە؛ indeterminateness *n*: نادیاری، ناڕوونی، دیارینەکراوی) ◌ نامشخص، نامعین، نامعلوم، بینتیجە

**indeterminate vowel** = schwa

**indetermination** /ˌɪndɪˈtɜːmɪneɪʃn/ *noun*

یەکلایینەکراوەیی، بەلادانەخراوی، کۆتاییپێنەهاتوویی، بڕیارلەسەرنەدراوی، دوودڵی، تیامانەوە ◌ عدم قطعیت، بیتصمیمی

**indeterminism** *noun*

1 ئیندیتێرمینیزم (ریبازیکی فەلسەفی) 2 یەکلایینەکراوەیی، کۆتاییپێنەهاتوویی، بڕیارلەسەرنەدراوی، دیارینەکراوی ◌ (indeterministic *adj* ؛indeterminist *n*) 1 اختیار 2 عدم قطعیت

**index** /ˈɪndeks/ *noun, pl.* indexes or especially in technical use indices /ˈɪndɪsiːz/

1 پێرست، فیرست، نووانە، ناوەڕۆک (بابەت، ناو و هتد) 2 پیشاندەر، ئیندیکس 3 ئاماژە، مێزە 4 نوێنەر، توان، جا 5 دۆشاومژە، قامکی نیشانە یا شادە 6 میل 7 زمانە، میل، نەرە (ی تەرازوو) 8 (کتێب) جێ‌قامکی، ئیندیکس، پیت‌نیشان 9 (چاپ) نیشانە یان کارەکتەرێ کە بۆ راکێشانی سەرنج بۆ تێبینی‌یێکی راستەوخۆ بەکاردێترێ (هەروەها fist) ◌ 1 فهرست، نمایه 2 شاخص 3 اشاره 4 توان، نما 5 انگشت اشاره 6 عقربه 7 زبانەی ترازو 8 جاانگشتی 9 ایندکس

**indexation** /ˌɪndekˈseɪʃn/ *noun*, also indexing

ئیندیکس‌دانان، ئیندیکساندن ◌ شاخص‌گذاری

**index card** *noun*

کارتی هەڵگرتن یان ئیندیکس ◌ کارت بایگانی

**index finger** *noun*

دۆشاومژە، قامکی شادە، قامکی نیشانە ◌ انگشت اشاره

**index fossil** *noun*

بووبەردی رێنوێن یان ئیندیکس ◌ سنگوارە یا فسیل شاخص

**indexical** /ɪnˈdeksɪk(ə)l/ *adjective*

1 (زمانەوانی) = deictic 2 پێرست‌ئاسا ◌ 1 = deictic 2 فهرست‌گونه

**indexless** *adjective*

بێ‌ناوەڕۆک ◌ بدون فهرست

**index-linked** *adjective*

ئیندیکس‌دار، بەپێی ئیندیکس ( index-linking *n*) ◌ مبتنی بر شاخص

**India ink** = Indian ink

**Indiaman** *noun, pl.* Indiamen

(مێژوویی) کەشتی کارداری یان بازرگانی لەگەڵ هیند ◌ ایندیامن

**Indian** /ˈɪndiən/ *adjective, noun*

*adj* 1 هیندی، هیندی، هیند(و)ستانی، سەربە هیند یان باشووری ئاسیا 2 سەربە ئەمریکایی‌یە رەسەنەکان یان زمانەکانیان *n* 1 خەڵکی هیندووستان 2 سووریێست، American Indian، دانیشتوانی رەسەنی ئەمریکا (باکوور، نێوەراست و باشوور) 3 هەریەک لە زمانە رەسەنەکانی سووریێستەکان 4 (ب.ت. جاران و یان لە دەقە مێژوویی‌یەکاندا) رەسەن یان دانیشتووی نیمچەوشکاری هیندوستان Indianization (also Indianism *n*) Indianisation) *n*؛ بنەرەت: گەلانی رەسەنی ئەمریکا(یی) بە "Indian" ناسران، چونکو کریستوفێر کۆلۆمبوس Christopher Columbus و خەڵکانی دی کاتێ گەیشتنە کەنارەکانی رۆژهەلاتی ئەمریکا، پێیان وابوو لە رێگایێکی تازەوە گەیشتوونەتە بەشێکی هیندوستان؛ تێبینی: وشەکانی Indian و Red Indian ئەمرۆکانە کەم‌باون و لە جیاتی ئەوانە زۆرتر American Indian بەکاردێترێ) ◌ *adj* 1 هندی 2 وابسته به سرخ‌پوستان یا زبانشان *n* 1 اهل هندوستان 2 سرخ‌پوست 3 و 4 ایندین

**Indianan** /ˌɪndɪˈan(ə)n/ *noun, adjective*

*n* خەڵکی هەرێمی ئیندیانا Indianaی ئەمریکا *adj* ئیندیانایی ◌ ایندیایی

**Indian bread** = tuckahoe

**Indian club** *noun*

(وەرزش) میل (وەک هی زۆرخانە) ◌ میل

**Indian corn** *noun*, also maize

گەنمەشامی، گوڵەپێغەمبەرە، گەرمەشانی، زورات ◌ بلال

**Indian file** = single file

**Indian giver** *noun*

(جاروبار سووکانە) کەسێ کە دیاری‌یێ دەبەخشێ و پاشان وەری دەگرێتەوە ◌ ایندین گیور

**Indian giver** *noun*

بەخشینی دیاری و پاشان وەرگرتنەوەی ◌ ایندین گیوینگ

**Indian hemp** = cannabis

**Indian ink** *noun*, India ink

جەوهەری کێشانەوە ◌ مرکب چین

**Indian licorice** *noun*, also rosary pea

شیرین‌بەلەکی هیندی: جۆرێ رەز یان مێوی گەرمێنان، لە خێزانی legume، دانەکەی بۆ تەزبێح و رەگەکەی وەک جێگرەوەی شیرین‌بەلەک بەکاردێترێ [ Abrus precatorius] ◌ عشقەی چشم خروس

**Indian meal** *noun*, also cornmeal

ئاردی گەنمەشامی ◌ آرد ذرت

**Indian millet** = durra

**Indian paintbrush** *noun*, also painted cup

1 پەرەمووچەی هیندی؟: کۆمەڵە رووەکێکی نیوەمشەخۆر semiparasitic لە توخمی Castilleja و لە خێزانی snapdragon، بە bract ی پەرەئاسای رەنگی گەشەوە 2 = orange hawkweed ◌ زاغک

**Indian pipe** *noun*

لوولەهیندی؟: جۆرێ گیا یان رووەکی saprophytic سپی مێوین waxy ی بێ‌گەڵا، لە خێزانی Monotropaceae، Indian-pipe، هی ئاسیا و ئەمریکای باکووری [*Monotropa uniflora*] ◌ نوعی گیاه

**Indian pudding** *noun*

جۆرێ پودینگ کە زۆرتر بە ئاردەگەنمەشامی cornmeal، دۆشاو molasses و شیر دروست دەکرێ ◌ نوعی پودینگ

**Indian red** *noun*

1 گلی سووری زەردباو، زۆرتر وەک رەنگ و پۆلیشی کانزا بەکاردێترێ 2 جۆرێ رەنگی

سووری مەیلەوزەرد کە زۆرتر لە ئۆکسایدی ئاسن پێکهاتووە ۞ 1 خاک سرخ مایل بە زرد 2 ایندین رد

**Indian summer** *noun*

1 هەوای گەرمی پاییز 2 سەرکەوتن، بەختەوەری (ب.ت. سەردەمی ئاخری عومر) ۞ 1 هوای گرم پاییزی 2 خوشبختی، موفقیت

**Indian tobacco** *noun*

توتنی هیندی: رووەکێکی ئەمریکای باکووری، لە خێزانی lobelia بە گوڵی شینی وردەوە [*Lobelia inflata*] ۞ تنباکوی هندی

**India paper** *noun*

کاغزی هیندی، کاغەزی چین: 1 جۆرێ کاغەزی ناسک و مژۆک absorbent 2 جۆرێ کاغەزی چاپی زۆرناسک، جیڕ و مات، ب.ت. لە کتێبە پیرۆزەکاندا بەکاردێنرێ ۞ کاغذ هندی

**India rubber** /ˌɪndiə ˈrʌbə(r)/ *noun*

1 سرە 2 جیر (ی سروشتی) ۞ 1 پاککن 2 لاستیک

**India rubber (tree)** = rubber tree

**India turnip** = jack-in-the-pulpit

**India wrestling** *noun*

1 جۆرێ زۆرانبازی 2 = arm wrestling ۞ نوعی کشتی

**Indic** /ˈɪndɪk/ *noun, adjective*

*n* کۆمەڵێ لە زمانە هیند و ئەوروپاییەکان، کە سانسکریتی و زمانە هیندییە نۆژەنەکان پێکدێنێ *adj* سەربەو کۆمەڵە زمانییە ۞ ایندیک

**indican** *noun*

1 سولفاتی پۆتاسیۆمی ئیندۆکسیل indoxyl potassium $C_8H_6NO_4SK$، ماکێکی هەشپێکهێنێ یان نیلساز $C_8H_7NO_4S$ کە لە میز و شلە گیانەوەرییەکانی تری بە شێوەی خوێ دۆزراوەتەوە 2 گلۆکۆزایدێ $C_{14}H_{17}NO_6$، لەو رووەکانە دەگیرێ کە نیل یان هەش دێنن و سەرچاوەیێکی هەشی سروشتییە ۞ ایندیکان

**indicant** /ˈɪndəkənt/ *adjective*

نیشاندەر، دەربڕ، ئاماژەپێکەر ۞ دال، بیانگر

**indication** /ˌɪndɪˈkeɪʃn/ *noun*

1 نیشانە، بەرژەنگ، درف 2 بەڵگە 3 ئاماژە(پێکردن)، نیشانە، نیشاندان، دەرخستن، مێزە 4 ئاگاداری (*adj* indicational: سەربە یان پێوەندی بە indication ـەوە هەیە) ۞ 1 علامت 2 دلیل 3 اشارە، دلالت 4 خبر

**indicative** /ɪnˈdɪkətɪv/ *adjective, noun*

*adj* 1 (رێزمان) ئاگاداری 2 نیشانەی، پیشاندەری *n* کاری ئاگاداری ( indicatively *adv*) ۞ *adj* 1 اخباری 2 علامت *n* فعل اخباری

**indicator** /ˈɪndɪkeɪtə(r)/ *noun*

1 (ماشێن) چرای لاگۆڕین، چرای بادانەوە 2 دەپ یان بۆردی ئاگاداری، پەردەی ئاگاداری (کە تازەترین زانیاری لەبارەی رۆیشتن و گەیشتنی شەمەندەفەر و فڕۆکەکان پیشان دەدا) 3 میل (هی تێمپراچێر، خێرایی speed و گوشار pressure) 4 (کیمیا) ناسەرەوە 5 نیشانە، بەرژەنگ ۞ 1 راهنما 2 تابلوی راهنما 3 عقربە 4 (شیمی) معرف 5 علامت

**indicatory** /ɪnˈdɪkət(ə)ri, US ˌɪndɪˈkeɪt(ə)ri/ = index

**indices** /ˈɪndɪsiːz/ = index

**indicium** /ˈɪnˈdɪʃɪəm/ *noun, pl.* indicia /ɪnˈdɪʃɪə, -sɪə/

بەرژەنگ، نیشانە (بنەڕەت: لە *index* -*indic* لاتین "نیشانە") ۞ علامت

**indictable** /ɪnˈdaɪtəbl/ *adjective*

شیاوی تاوانبارکردن، شیاوی گوناهبارکردن ۞ قابل اتهام

**indiction** /ɪnˈdɪkʃ(ə)n/ *noun*

1 (مێژوویی، ئیمراتۆری رۆم) دانانی باجی پازدەساڵە 2 ماوە یان سەردەمێکی پازدەساڵە ۞ 1 وضع مالیات پانزدهساله 2 دورەی پانزدەساله

**indictment** /ɪnˈdaɪtmənt/ *noun*

داوانامە، تاوانبارکردن، گوناهبارکردن ۞ کیفرخواست، اتهام

**indie** /ˈɪndi/ *noun, adjective*

*adj* 1 تیپی موسیقای ئازاد یان سەربەخۆ 2 کۆمپانی (سەربەخۆ و ب.ت. موزیکی گەلی بەرهەم دێنێ) *n* ئازاد، سەربەخۆ ۞ *adj* 1 گروه موسیقی مستقل 2 شرکت *n* مستقل

**indifference** /ɪnˈdɪfrəns/ *noun*

کەمتەرخەمی، بێدەربەستی، بێخەمی، بێخەیاڵی، لامەرلایی، گوێپێنەدان، پشتگوێخستن ۞ بیتوجهی، لاقیدی، بیاعتنایی

**indifferent** /ɪnˈdɪfrənt/ *adjective*

1 کەمتەرخەم، گوێپێنەدەر، بێخەم، بێخەیاڵ 2 بێلایەن، نادەمارگرژ 3 ناگرنگ، بێبایەخ، هیچەکە، نە ئەوندە باش، ئاسایی، دەستە، ئەندازە، مامناوەند ۞ 1 بیتوجە، بیتفاوت 2 بیطرف 3 بیاهمیت، جزئی

**indifferentism** *noun*

ناجیاوازیباوەڕی: باوەڕێ کە پێی وایە جیاوازی باوەڕە دینییەکان شتێکی وانین ۞ ایندفرنتالیسم

**indifferentist** *noun*

ناجیاوازیباوەڕ، ئیندیفرێنتالیست ۞ ایندفرنتالیست

**indifferently** *adverb*

کەمتەرخەمانە،بەکەمتەرخەمییەوە ۞ بابیاعتنایی

**indigence** /ˈɪndɪdʒiːn/ *noun*

ناچاری، نەبوونی، دەستەنگی، نەداری، هەژاری ۞ تهیدستی، فقر

**indigene** /ˈɪndɪdʒiːn/ *noun*
کەسێکی ڕەسەن، بوومی، بنەنشین، سەرەتانشین ◌ (آدم) بومی
**indigenization** *noun*
خستنەژێر ڕکێفی خەڵکی ڕەسەنەوە، ڕەسەناندن ◌ بومی‌سازی
**indigenous** /ɪnˈdɪdʒənəs/ *adjective*
1 سروشتی، خۆرسکی 2 دانیشتووی ڕەسەن، بوومی، ڕەسەن، بنەنشین، سەرەتانشین: *the indigenous peoples/languages of the area* ◊ *the indigenous culture* ◊ *indigenous plants* ◌ 1 طبیعی 2 بومی
**indigenously** /ɪnˈdɪdʒənəsli/ *adverb*
1 سروشتی‌یانە 2 سەرەتانشینانە، ڕەسەنانە، بە شێوەیەکی بوومی ◌ 1 به طور طبیعی 2 به طور بومی
**indigenousness** /ɪnˈdɪdʒənəsnəs/ *noun*
خۆماڵی بوون، سەرەتانشین‌بوون، بوومی‌بوون ◌ بومی بودن
**indigent** /ˈɪndɪdʒənt/ *adjective, noun*
*adj* کەم‌دەس، هەژار، نەدار، حەوەجێ‌دار، بەڵەنگاز، دەس‌تەنگ، فەقیر *n* کەسێکی دەس‌تەنگ ◌ *adj* تهی‌دست، فقیر *n* آدم تهی‌دست
**indigested** *adjective*, also archaic term for undigested
1 هەڵنەتاواو، هەرس‌نەکراو 2 لێکەوەنەدراو، هەڵنەسەنگێنراو 3 شێواو، شپرزە، تێکەڵ‌وپێکەڵ، ئاڵۆز ◌ 1 هضم‌نشده 2 نسنجیده 3 بی‌ترتیب
**indigestibility** /ˌɪndɪdʒestəˈbɪlɪti/ *noun*
لەهەرس‌نەهاتوویی، هەرس‌نەکراوی، هەڵنەتاواوی ◌ غیرقابلیت هضم
**indigestible** /ˌɪndɪˈdʒestəbl/ *adjective*
1 لەهەرس‌نەهاتوو، قورس، سووک نییە، هەرس‌نەکراو، هەڵنەتاواو 2 قورس، گران، درەنگ‌لێ‌تێگەیشتوو، ئاڵۆز، درەنگ دەخوێنرێتەوە، سەخت، لێ‌تێنەگەیشتوو ◌ 1 غیرقابل هضم، دیرهضم 2 غیرقابل فهم
**indigestibly** /ˌɪndɪˈdʒestəbli/ *adverb*
لەهەرس‌نەهاتووانە، بە شێوەیەکی هەرس‌نەکراو ◌ به طور غیرقابل هضم
**indigestion** /ˌɪndɪˈdʒestʃən/ *noun*
بەدهەرسی، گرفت، پیرومەر ◌ سوء هاضمه
**indigestive** /ˌɪndɪˈdʒestɪv/ *adjective*
تووش‌بوو بەدهەرسی یان گرفت ◌ مبتلا به سوء هاضمه
**indign** /ɪnˈdaɪn/ *adjective*
لێنەوەشاو، لێنەهاتوو ◌ ناشایسته
**indignant** /ɪnˈdɪgnənt/ *adjective*
تووڕە، ڕق‌هەستاو، سوورەوەبوو: *an indignant look* ◌ خشمگین، برآشفته
**indignantly** /ɪnˈdɪgnəntli/ *adverb*
بە ڕق‌هەستانەوە ◌ با عصبانیت
**indignation** /ˌɪndɪgˈneɪʃn/ *noun*
تووڕەیی، ڕق‌هەستان، غەیدین، ئاژر ◌ خشم، برآشفتگی
**indignity** /ɪnˈdɪgnəti/ *noun, pl.* indignities
بێ‌ڕێزی، بێ‌حورمەتی، سووکایەتی ◌ بی‌احترامی، توهین
**indigo** /ˈɪndɪgəʊ, US -goʊ/ *noun* (*pl.* indigos or indigoes), *adjective*
*n* 1 ڕووەکی نیل، ڕووەکی خەم؟، گیاهەکەش و جۆرە [*Indigofera tinctoria*] پێوەندی‌دارەکان] 2 خەم، نیل، چویت، هەش، خومی شین، خومی نیل، ڕەنگی نیلی *adj* نیلی (لە شەبەنگدا نێوان شین و بەنەوش؛ بنەڕەت: لە پۆرتوگالی، بە ڕێگای لاتینەوە لە *indigo* یونانی، *indikos* ئەویش لە *indikon* هێندی‌یەوە "ڕەنگ") ◌ *n* 1 گیاه نیل 2 نیل، رنگ نیلی *adj* نیلی
**indigo plant** *noun*
ڕووەک یان دەوەنی نیل یان خەم؟ ◌ گیاه یا بوته‌ی نیل
**indigo snake** *noun*
جۆرێ ماری ئەمریکای زلەی بێ‌وەی، زۆرتر ڕەشی شین‌باو [*Drymarchon corais*] ◌ نوعی مار
**indiminishable** *adjective*
کەمەوەنەبوو، لەداشکان‌نەهاتوو، داناشکێ، کەم نابێتەوە ◌ کاهش‌ناپذیر
**Indio** /ˈɪndɪəʊ/ *noun, pl.* Indios
ئەندامی هەریەک لە گەلانی ڕەسەنی ئەمریکا یان ڕۆژهەڵاتی ئاسیا (ناوچە ژێردەسەڵاتەکانی جارانی سپانیا یان پۆرتوگال) ◌ ایندیو
**indirect** /ˌɪndəˈrekt, US -daɪˈr-/ *adjective*
1 ناڕاستەوخۆ، ناڕاست، بەپێچ‌وپەنا، تیان 2 خوار، لار 3 ناسەرەکی، لاوەکی، لاتەنیشتی 4 (سەودا) چەوت، نادروست، فێلاوی، دەغەلانە ◌ 1 غیرمستقیم 2 کج 3 ثانوی 4 تقلب‌آمیز
**indirection** /ˌɪndɪˈrekʃn, US -daɪˈr-*noun*
1 کاری ناڕاستەوخۆ 2 نادروستی، فێڵ، چەوتی، گزەونی ◌ 1 کار غیرمستقیم 2 تقلب
**indirectly** /ˌɪndəˈrektli, US -daɪˈr-/ *adverb*
ناڕاستەوخۆیانە، لە لاوە ◌ به طور غیرمستقیم
**indirectness** /ˌɪndəˈrektnəs, US -daɪˈr-/ *noun*
ناڕاستەوخۆیی، ناڕاست‌بوون ◌ غیرمستقیم بودن
**indirect object** *noun*
(ڕێزمان) بەرکاری ناڕاستەوخۆ، تەواوکەری بەیاریە ◌ مفعول غیرمستقیم
**indirect question** *noun*
(ڕێزمان) پرسیاری ناڕاستەوخۆ (وەک She

نیشانەی asked where I was going پرسیاری بۆ دانانری) ◌ پرسش غیرمستقیم

**indirect speech** *noun*, also reported speech (ڕێزمان) گێڕانەوەی ناڕاستەوخۆ ◌ نقل قول مستقیم

**indirect tax** *noun*
باجی ناڕاستەوخۆ ◌ مالیات غیرمستقیم

**indirect taxation** *noun*
باجدانانی ناڕاستەوخۆ ◌ مالیات‌بندی غیرمستقیم

**indiscernibility** /ˌɪndɪsɜːnəˈbɪlətɪ, US -sɜːrn-/ *noun*
لەلێک‌کردنەوەنەهاتوویی ◌ غیرقابلیت تشخیص

**indiscernible** /ˌɪndɪˈsɜːnəbl, US -ˈsɜːrn-/ *adjective*
لێکەوەنەکراو، جیاناکرێتەوە، لێک‌ناکرێتەوە ◌ غیرقابل تشخیص

**indiscernibly** /ˌɪndɪˈsɜːnəbli, US -ˈsɜːrn-/ *adverb*
بە شێوەیەکی لێکەوەنەکراو ◌ بە طور غیرقابل تشخیص

**indiscerptibility** *noun*
لێکەوەنەبوویی، لێک‌هەڵنەوەشاوی، لەهەڵوەشانەوەنەهاتوویی ◌ تجزیەناپذیری

**indiscerptible** *adjective*
لێکەوەنەبوو، لێک‌هەڵنەوەشاو، لەهەڵوەشانەوەنەهاتوو ◌ تجزیەناپذیر

**indiscipline** /ɪnˈdɪsɪplɪn/ *noun*
ناڕێکی، ناڕێک‌وپێکی، بێ‌دیسیپلینی، بێ‌بەندوبەستی ◌ بی‌نظمی

**indiscoverable** /ˌɪnˈdɪˈskʌvərəbl/ *adjective*
نەدۆزراو، نادۆزرێتەوە، لەدۆزینەوەنەهاتوو ◌ کشف‌ناپذیر

**indiscreet** /ˌɪndɪˈskriːt/ *adjective*
هەڵەشە، سەرچڵ، سەرەڕۆ، گەوج، بێ‌ئەقڵ، دەم‌بەهاوار، دەم‌بڵاو، ناژیرانە: *an indiscreet* *It was indiscreet of him to* ◊ *comment* *disclose that information* ◌ بی‌احتیاط، احمق، نامعقول

**indiscreetly** /ˌɪndɪˈskriːtli/ *adverb*
دەم‌بڵاوانە، سەرچڵانە ◌ بە طور بی‌احتیاط

**indiscrete** /ˌɪndɪˈskriːt/ *adjective*
یەک‌پارچە، یەک‌تەختە، یەک‌تیکە، پێکەوەبەستراو، پێکبەند، ناجیا، نالێک‌جیا، پێکەوە (*adv* indiscretely: بە شێوەیەکی یەک‌پارچە، پێکەوەبەستراوانە) ◌ ناگسستە

**indiscretion** /ˌɪndɪˈskreʃn/ *noun*
هەڵەشەیی، سەرچڵی، سەرەڕۆیی، گەوجی، بێ‌ئەقڵی، دەم‌بەهاواری، دەم‌بڵاوی: *dietary indiscretion* ◌ بی‌ملاحظگی، بی‌احتیاطی

**indiscriminate** /ˌɪndɪˈskrɪmɪnət/ *adjective*
لێک‌نەدەرەوە، لێکەوەنەدراو، دیاری‌نەکراو، جیانەکراو، نادیار، ڕەمەکی، هەڕەمەکی، (*adv* indiscriminately: بێ‌جیاوازی، بێ‌دیاری‌کردن؛ *n* indiscriminateness) ◌ بدون تمیز، تصادفی، نامشخص، درهم‌برهم

**indiscrimination** /ɪndɪˌskrɪməˈneɪʃn/ *noun*
1 لێکەوەنەکردن، لێک‌نەکردنەوە، جیانەکردنەوە 2 جیاوازی‌دانەنان ◌ 1 عدم تمیز 2 عدم تبعیض

**indispensability** /ˌɪndɪspensəˈbɪlɪtɪ/ *noun*
پێویستی، پێوەژیاوی ◌ ضرورت، وجوب

**indispensable** /ˌɪndɪˈspensəbl/ *adjective*
پێویست، پێوەژیاو، بێ‌هەڵنەکردوو، زۆرگرنگ، ◊ *an indispensable obligation* :essential *an -nsable member of the staff* (*adv* indispensably /ˌɪndɪˈspensəbli/: پێویستانە، بە شێوەیەکی پێویست؛ *n* indispensableness) ◌ ضروری، واجب

**indisposed** /ˌɪndɪˈspəʊzd, US -ˈspoʊzd/ *adjective*
1 نەخۆش، ناساز 2 بێ‌مەیل، پێخۆش‌نەبوو، بێزار ◌ 1 بیمار 2 بی‌رغبت

**indisposition** /ˌɪndɪspəˈzɪʃn/ *noun*
نەخۆشی، ناسازی، بێ‌مەیلی، پێخۆش‌نەبوون، بێزاری، disinclination ◌ کسالت، بی‌رغبتی

**indisputability** /ˌɪndɪspjuːtəˈbɪlɪtɪ/ *noun*
مشت‌ومڕهەڵنەگر(توو)ی(ی)، مشت‌ومڕنەویستی، مۆگەری، نکوڵی‌لێ‌نەکراوی ◌ بحث‌ناپذیری

**indisputable** /ˌɪndɪˈspjuːtəbl/ *adjective*
مشت‌ومڕهەڵنەگر(توو)، مشت‌ومڕنەویست، مۆگەر، حاشای لێ‌ناکرێ، بەدرۆ ناخرێتەوە، نکوڵی‌لێنەکراو، نکوڵی لێ‌ناکرێ، ◌ *indisputable proof* :unquestionable بحث‌ناپذیر

**indisputably** /ˌɪndɪˈspjuːtəbli/ *adverb*
بێ‌ئەملاوئەولا ◌ مسلماً

**indissolubility** /ɪndɪˌsɒljəˈbɪlɪtɪ, US -ˈsɑːl-/ *noun*
نەتواوەیی، نەتوێنراوی، لەتوانەوەنەهاتوویی ◌ حل‌ناپذیری

**indissoluble** /ˌɪndɪˈsɒljəbl, US -ˈsɑːl-/ *adjective*
1 نەتواوە، ناتوێتەوە، نەتوێنراو، لەتوانەوەنەهاتوو 2 تێکنەچوو، ناشێوێ، تێک‌ناچێ، هەڵناوەشێتەوە، نەشێواو، خراپ‌نەبوو، پتەو، تۆکمە، درێژخایەن، چەسپیو، سەقام‌گرتوو، هەمیشەیی، *an indissoluble* :permanent *contract* ◌ 1 حل‌نشدنی 2 محکم، پایدار

**indissolubly** /ˌɪndɪˈsɒljəbli, US -ˈsɑːl-/ *adverb*

پتەوانە، تۆکمانە، بە پتەوی، سەقامگرتووانە، بە شێوەیێکی پتەو یان تۆکمە ۞ بە طور محکم یا پایدار

**indistinct** /ˌɪndɪˈstɪŋkt/ *adjective*

نادیار، روون نییە، نامەعلووم، تەماوی، مزاوی، ناڕۆشن، لێڵ، تاریک، blurred: *-stinct figures in the fog* ۞ نامشخص، نامعلوم، نامفهوم

**indistinction** *noun*

نادیاری، ناڕۆشنی، لێڵی، تەماویبوون ۞ عدم وضوح

**indistinctive** /ˌɪndɪˈstɪŋktɪv/ *adjective*

لێکەوەنەکردوو ۞ فاقد تشخیص

**indistinctively** /ˌɪndɪˈstɪŋktɪvli/ *adverb*

لێکەوەنەکردووانە ۞ بە طور فاقد تشخیص

**indistinctly** /ˌɪndɪˈstɪŋktli/ *adverb*

بە شێوەیەکی ناڕوون، بە شێوەیەکی نادیار ۞ بە طور نامعلوم یا نامشخص

**indistinctness** /ˌɪndɪˈstɪŋktnəs/ *noun*

ناڕوونی، ناڕۆشنی، تاریکی، تەماویبوون، نادیاربوون، لێڵبوون ۞ عدم وضوح، غیرمشخص بودن

**indistinguishable** /ˌɪndɪˈstɪŋgwɪʃəbl/ *adjective*

1 لێکەوەنەکراو، ناناسرێتەوە، جیاناکرێتەوە، جیانەکراو، (تا رادەیێ) وەکیەک 2 نادیار، ناڕوون، تەماوی ۞ 1 غیرقابل تشخیص 2 نامشخص

**indistinguishably** /ˌɪndɪˈstɪŋgwɪʃəbli/ *adverb*

بە شێوەیەکی لێکەوەنەکراو ۞ بە طور غیرقابل تشخیص

**indistributable** *adjective*

دابەشنەکراو، دابەش ناکرێ ۞ توزیعناپذیر

**indium** /ˈɪndiəm/ *noun*

(کیمیا) ئیندیۆم (بە ژ.گ. 49، ن. In) ۞ ایندیم

**individual** /ˌɪndɪˈvɪdʒuəl/ *adjective, noun*

*adj* 1 تاک، تاکەکەسی، (بە)جیا، بە تەنیا، تایبەتی، تایبەت، سەربە یان بۆ کەسێکی تایبەتی، بۆ کەسێ: *an individual effort* ◊ *We interviewed each individual member of the community* 2 (بێ‌باو) = inseparable *n* کەس، مرۆڤ، یەکێک، مرۆی سەیر ۞ *adj* فردی، منفرد، انفرادی، جداگانە، ویژه، اختصاصی، تکی، یکنفره *n* آدم، آدم عجیب

**individualism** /ˌɪndɪˈvɪdʒuəlɪzəm/ *noun*

تاکخوازی، تاکباوەری، تاکگەری، تاکڕەوی، ئیندیڤیجوالیزم: *Capitalism stresses innovation, competition and individualism* ۞ فردگرایی، خودمحوری

**individualist** /-əlɪst/ *noun*

تاکخواز، تاکگەر، تاکباوەڕ ۞ فردگرا

**individualistic** /ˌɪndɪˌvɪdʒuəˈlɪstɪk/ *adjective*

سەربە تاکباوەری، تاکگەریانە: *an individualistic culture* ۞ فردگرایانە

**individuality** /ˌɪndɪˌvɪdʒuˈæləti/ *noun, pl.* individualities

تاکێتی، کێیەتی، تاک، کەسێتی ۞ فردیت، فرد، شخصیت

**individualization** /ɪndɪˌvɪdʒuəlɪˈzeɪʃn/ *noun*

تاکیکردن، تاکەتاکەکردن، تاکاندن ۞ فردیسازی

**individualized** /ɪndɪˌvɪdʒuəlaɪzd/ *adjective*

تاکی(کراو)، تاکێنراو، تایبەتی ۞ فردی، خاص

**individually** /ˌɪndɪˈvɪdʒuəli/ *adverb*

تاکتاک، یەکەیەکە، بە شێوەیەکی جیا، یەکیەک: *individually wrapped chocolates* ◊ *The manager spoke to them all individually* ۞ بە طور جداگانە

**indivisibility** /ˌɪndɪˌvɪzəˈbɪləti/ *noun*

لەدابەشنەهاتوویی، دابەشنەکراوی ۞ غیرقابلیت تقسیم

**indivisible** /ˌɪndɪˈvɪzəbl/ *adjective*

لەدابەشنەهاتوو، دابەش ناکرێ، دابەشنەکراو، جیاناکرێتەوە، جیانەکراو ۞ تقسیمنشدنی، تفکیکناپذیر

**indivisibly** /ˌɪndɪˈvɪzəbli/ *adverb*

دابەشنەکراوانە، لەدابەشنەهاتووانە ۞ بە طور تقسیمناپذیر

**Indo-** /ˈɪndəʊ, US ˈɪndoʊ/ *prefix*

پێشگر: هیندی، هندی، سەربە هیندوستان: *Indo-Iranian* ۞ پیشوند: هندی، وابستە بە هندوستان

**Indo-Aryan** *adjective*

1 هیند و ئاریایی (سەربە گەلی هیند و ئەوروپایی کە لە هەزارەی دووەمی پێشزایین هێرشیان بردەسەر رۆژاوای باکووری هیند) 2 Indic ۞ هند و آریایی

**Indo-Chinese** *adjective*

هیند و چینی، سەربە کۆمەڵە دوورگەی هیند و چین کە بریتین لە بێرمە Burma (میانمار Myanmar)، تایلەند، مالایا Malaya، لائوس Laos، کامبۆجیا Cambodia و ڤیێتنام Vietnam ۞ هند و چینی

**indocile** /ɪnˈdɒsɪl/ *noun*

سەرپزێو، سەرکێش، نادەستەمۆ، نامالی، سرک، intractable ۞ سرکش، رامنشدنی

**indocility** /ˌɪndɒˈsɪlɪti/ *noun*

سەرپزێوی، سەرکێشی، نادەستەمۆیی ۞ سرکشی

**indoctrination** /ɪnˌdɒktrɪˈneɪʃn, US -ˌdɑːk-/ *noun*

فێرکردن، گۆشکردن، ناوی گوێ دادان ۞ تلقین

**Indo-European** *noun, adjective*
*n* 1 زمانی هیند و ئەوروپایی سەرەتا 2 خێزانی زمانە هیند و ئەوروپایی‌یەکان 3 قسەپێکەر بە زمانی هیند و ئەوروپایی، ب.ت. زمانی هیند و ئەوروپایی سەرەتا *adj* سەربە هیند و ئەوروپایی ◌ هند و اروپایی
**Indo-European languages** *noun, pl.*
زمانە هیند و ئەوروپایی‌یەکان ◌ زبان‌های هند و اروپایی
**Indo-Germanic** *adjective,* also Indo-European
هیند و ئەوروپایی ◌ هند و اروپایی
**Indo-Iranian** *noun, adjective*
*n* بنخێزان یان لاتیرەی زمانە هیند و ئەوروپایی‌یەکانی هیند و ئێران *adj* سەربە هیند و ئێرانی ◌ هند و ایرانی
**indole** /ˈɪndəʊl/ *noun*
(کیمیا) ئیندۆل، ئیندول: ئاوێتەیێکی تفت‌ئاسای کریستالی $C_8H_7N$ بە بۆنێکی ناخۆشەوە، لە قەتران و پیسایی‌دا هەیە ◌ ایندول
**indoleacetic acid** /ˌɪndəʊləˈsiːtɪk, US -ˈsɛtɪk/ *noun*
(زیندەکیمیا) ترشەڵۆکی ئیندۆلیستیک: هۆرمۆنێکی رووەکی plant hormone کریستالی $C_{10}H_9NO_2$ کە تاوی هەڵدان growth و پێکهاتنی رەگ دەدا ◌ اسید ایندولستیک
**indolence** /-ǝns/ *noun*
تەمەڵی، داهێزراوی، تەپی، داوەشاوی، لەش‌گرانی، تەوەزەلی، سستی ◌ تنبلی، بی‌حالی، کسالت
**indolent** /ˈɪndələnt/ *adjective*
تەمەڵ، تەپلوس، داهێزراو، تەپ، داوەشاو، لەش‌گران، تەوەزەل، سست ◌ تنبل، بی‌حال
**indolently** /ˈɪndələntli/ *adverb*
بە تەمەڵی ◌ با تنبلی
**Indologist** *noun*
هیندناس ◌ هندشناس
**Indology** /ɪnˈdɒlədʒi/ *noun*
هیندناسی ◌ هندشناسی
**indomitable** /ɪnˈdɒmɪtəbl, US ɪnˈdɑːm-/ *adjective*
لەشکان‌نەهاتوو، نەبەز، لەگرتن‌نەهاتوو، کۆڵنەدەر، تۆکمە، پتەو، قایم، سەخت: *indomitable courage* ◌ تسخیرناپذیر، راسخ
**indomitably** /ɪnˈdɒmɪtəbli, US ɪnˈdɑːm-/ *adverb*
لەشکان‌نەهاتووانە، نەبەزانە ◌ بە طور شکست‌ناپذیر
**Indonesian** /ˌɪndəˈniːʒən/ *adjective, noun*
*adj* سەربە ئیندۆنیزیا *n* 1 زمانی ئیندۆنیزیایی 2 خەڵکی ئیندۆنیزیا، ئیندۆنیزیایی ◌ *adj* وابستە به اندونزیا *n* 1 زبان اندونزیایی 2 اهل اندونزیا
**indoor** /ˈɪndɔː(r)/ *adjective*
لە نێوەوە، لە ژوورەوە، نێوخۆیی، نێوەکی ◌ داخلی، درونی
**indoors** /ˌɪnˈdɔːz, US ˌɪnˈdɔːrz/ *adverb*
لە ماڵەوە، لە ژوورەوە، لەنێو ماڵ‌دا ◌ در خانە
**Indo-Pacific** *adjective*
1 سەربە ئۆقیانووسی هیندی 2 = Austronesian ◌ هند و پاسیفیک
**indophenol** *noun*
هەریەک لە رەنگەکانی سەوز یا شین، بەرهەمی quinonimine ◌ ایندوفنول
**indorsement** = endorsement
**indoxyl** *noun*
ئیندۆکسیل: ئاوێتەیێکی کریستالی $C_8H_7NO$، لە رووەک و گیانەوەران‌دا هەیە ◌ ایندوکسیل
**indraft** /ˈɪndrɑːft/ *noun,* also indraught /ˈɪndrɑːft/
(هەوا یان ئاو) تەوژم بەرەو نێوەوە ◌ جریان بە سوی داخل
**indrawn** /ˌɪnˈdrɔːn/ *adjective*
1 (هەناسە) قوت‌دراو، بۆ نێوەوەدراو، هەڵکێشراو: *She heard his quick indrawn breath of surprise* 2 لاتەریک ◌ 1 فروبردە 2 منزوی
**indri** /ˈɪndri/ *noun, pl.* indris
(گیانەوەرناسی) جۆرێ lemur ی زلەی کلک‌قوڵی ماداگاسکاری [*Indri indri*] ◌ ایندری
**indubitable** /ɪnˈdjuːbɪtəbl, US -ˈduː-/ *adjective*
دڵنیا، مسۆگەر، بێ‌گومان بێ‌دردۆنگی، بێ‌شک، ◌ *indubitable proof* :unquestionable بدون شبهە، مسلم
**indubitably** /ɪnˈdjuːbɪtəbli, US -ˈduː-/ *adverb*
بێ‌گومان، بە دڵنیایی(یەوە)، بێ‌شک، *He was, indubitably, the* :undoubtedly *most suitable candidate* ◌ بە طور قطع
**induced** *adjective*
هان‌دراو، کارتێ‌کراو ◌ القاشدە
**inducement** /ɪnˈdjuːsmənt, US ɪnˈduːsmənt/ *noun*
1 بزوێنەر، هان‌دەر، گورپێدەر، گوڕ، مایە 2 (بۆ جوان‌تر دەربڕین) دەم‌شیرینی، بەرتیل، دیاری ◌ 1 انگیزە، وسیلەی تشویق، موجب 2 هدیە
**inductance** /ɪnˈdʌktəns/ *noun*
(فیزیک) ئیندۆکتانس ◌ اندوکتانس
**induction** /ɪnˈdʌkʃn/ *noun*
1 ئیستقرا، ئینداکشن، ئەنجام‌گیری (لە کەمەوە بۆ زۆر، بڕوانە deduction) 2 (فیزیک) هان‌دان، کارتێ‌کردن؟ 3 پێکهێنان، بەرهەم‌هێنان، دروست‌کردن، هێنانەوە، هان‌دان، بزواندن 4

*induction into* :ناساندن، دامەزراندن، دانان 5 *the local business community* (ژنانی دووگیان، دەرمان) زووترلێ‌کردنەوە: *the* 6 *induction of labour* (بۆ سەربازی) گرتن، بانگ‌کردن ◌ 1 استقرا 2 القا(یش) 3 ایجاد، اقامه، انگیزش 4 معرفی، انتصاب 5 اینداکسیون 6 احضار

**induction coil** *noun*
(فیزیک) کۆیلی هان‌دان یان کارتێ‌کردن؟ ◌ قرقرەی القا

**induction course** *noun*
(فەرمانبەران و خوێندکارانی نوێ) ماوەی راهێنان یان ناساندن ◌ دورەی آشناسازی

**induction period** *noun*
(کیمیا) قۆناخ یان سەروبەندی هان‌دان ◌ دورەی انگیزش

**inductive** /ɪn'dʌktɪv/ *adjective*
1 ئیندداکتیف، ئیستقرایی: *an inductive inductive reasoning ◊ argument* (بروانە deductive) 2 هان‌درانە، سەربە 3 induction ◌ 1 استقرایی 2 القایی introductory =

**inductively** /ɪn'dʌktɪvli/ *adverb*
بە شێوەیەکی ئیستقرایی: *a theory derived - uctively from the data* ◌ بە طور استقرایی

**inductor** *noun*
1 کاردەرەوە 2 reactor کەسێکی ناسێنەر یان دامەزرێنەر 3 (فیزیک) هاندەرە، بەشێکی دەزگایێکی ئێلیکتریکی کە کار دەکاتە سەر بەشێکی تر ◌ ایندکتور

**indulgence** /ɪn'dʌldʒəns/ *noun*
1 زیادەرەوی، پێ‌داکێشی 2 پێش‌نەگرتن، لابۆشل‌کردن، ئازادهێشتن(ەوە)، بەربۆ بەرەلاکردن، لێ‌گەران، بەرنەگرتن، جڵەو بۆ شل‌کردن، بە دەمەوەدان، ئاسان‌گری، ئاسان‌کاری، شل‌گرتن 3 (کلێسەی کاتۆلیکی رۆمانی لە سەدەکانی نێوەراستدا) بەخشین، لێخۆش‌بوون، لێبوردن (لە گوناه) ◌ 1 افراط 2 عدم جلوگیری، تساهل 3 عفو

**indulgent** /ɪn'dʌldʒənt/ *adjective*
ئاسانگر، شل‌گرتوو، بەدەمەوەدەر، ئازادکردوو، نەرم، لێبوردە: *an ◊ indulgent parents indulgent smile* ◌ متساهل، نرم، گذشت‌کننده

**indulgently** /ɪn'dʌldʒəntli/ *adverb*
لێبوردانە: *to laugh indulgently* ◌ با گذشت

**indult** /ɪn'dʌlt/ *noun*
(لە کلێسەی کاتۆلیکدا) دەستورنامە ◌ مجوز، جواز

**indumentum** /ˌɪndjʊ'mɛntəm/ *noun, pl.* indumenta
(گیانەوەرناسی و رووەکناسی) بەرگ، جلە (بۆ داپۆشینی موو یا پەڕی گیانەوەر یان رووەکی، لە لانینەوە "جل") ◌ اندومنتوم

**induna** /ɪn'du:nə/ *noun*
1 (ئەفریکای باشووری) سەرکاری ئەفریکایی 2 سەرۆک یان ئەندامی ئەنجومەنی خێڵێ ◌ 1 سرکارگر آفریقایی 2 رئیس یا عضو شورای قبیله

**indurate** /'ɪndjʊrɛɪt/ *adjective*
توند، رەق، سەخت(بوو) ◌ سفت(شده)

**induration** /ˌɪndjʊ'reɪʃn/ *noun*
توندبوون، رەق‌بوون، سەختی ◌ سفت‌شدگی

**indusium** /ɪn'dju:zɪəm/ *noun, pl.* indusia
(زۆرتر رووەک‌ناسی) بەرگ، رووپۆش، پەردە ◌ پوشش، غلاف

**industrial** /ɪn'dʌstrɪəl/ *adjective, noun*
*adj* پیشەسازی، سەربە پیشەسازی، پیشەسازانە، سەربە سازکاری، کارسازی‌یانە: *industrial unrest* (industrials) *n* بەشەکانی کۆمپانی پیشەسازی‌یەکان ◌ *adj* صنعتی *n* (در جمع) سهام در شرکت‌های صنعتی

**industrial action** *noun*
کردەوە کرێکاری‌یەکان، مانگرتن ◌ اقدامات کارگری

**industrial alcohol** *noun*
ئەلکۆلی پیشەسازی (نە خواردنەوە) ◌ الکل صنعتی

**industrial archaeology** *noun*
شوێنەوارناسی پیشەسازی (لێکۆڵینەوەی دەزگا و کارخانە کۆنەکان) ◌ باستان‌شناسی صنعتی

**industrial arts** *noun, pl.*
هونەرە پیشەسازی‌یەکان ◌ حرفه و فن

**industrial diamond** *noun*
رووژە یا ئەلماسی پیشەسازی ◌ الماس صنعتی

**industrial dispute** *noun*
کێشەی نێوان کرێکاران و بەڕێوەبەرایەتی، کێشەی کرێکاری ◌ اختلاف کارگری

**industrial engineer** *noun*
ئەندازیاری پیشەسازی ◌ مهندس صنایع

**industrial engineering** *noun*
ئەندازیاریی پیشەسازی ◌ مهندسی صنایع

**industrial espionage** *noun*
سیخوڕی یان زانیاریگری پیشەسازی (دزینی زانیاری نهێنی لە کۆمپانیایەکەوە بۆ کۆمپانیایەکی تر) ◌ جاسوسی صنعتی

**industrial estate** *noun*
ناوچەی پیشەسازی (ب.ت. لە قەراخ شاردا) ◌ شهرک صنعتی

**industrialism** /ɪn'dʌstrɪəlɪzəm/ *noun*
سیستمی پیشەسازی (ڕێکخستە یان سیستمێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی لەسەر بنچینەی پیشەسازی) ◌ نظام صنعتی

**industrialist** /ɪn'dʌstrɪəlɪst/ *noun*
کارخانەدار، خاوەن‌کارخانە، خاوەن‌کارگە ◌ کارخانه‌دار

**industrialization** /ɪnˌdʌstriəlaɪˈzeɪʃn, US -ləˈz-/ *noun*
(بە)پیشەسازیکردن ۞ صنعتی کردن
**industrialized** *adjective*
پیشەسازییانە، پیشەسازی، پیشەسازانە ۞ صنعتی
**industrially** /-əli/ *adverb*
لەباری پیشەسازی(یەوە): *industrially advanced countries* ۞ از نظر صنعتی
**industrial park** = North American term for industrial estate
**industrial psychology** *noun*
دەروونناسی پیشەسازی یان پیشەسازانە ۞ روانشناسی صنعتی
**industrial relations** *noun, pl.*
پێوەندییە کرێکارییەکان، پێوەندییەکانی نێوان کرێکاران و خاوەنکاران ۞ روابط کارگری
**the Industrial Revolution** *noun*
گۆڕانکاری پیشەسازی یان پیشەسازانە ، گۆڕانە یان شۆڕشی پیشەسازی ۞ انقلاب صنعتی
**industrial sociology** *noun*
کۆمەڵناسی پیشەسازی یان پیشەسازانە ۞ جامعەشناسی صنعتی
**industrial-strength** *adjective*
بەهێز، بەقەوەت ۞ قوی
**industrial tribunal** *noun*
دادگای پیشەسازی (بۆ کێشەی نێوان کرێکار و خاوەنکاران) ۞ دادگاه صنعتی
**industrious** /ɪnˈdʌstriəs/ *adjective*
بەکار، بەچنگ، زەحمەتکێش، رەنجکێش، تێکۆشەر، (بە)ڕشت، شارەزا، کارامە، لێزان، کارزان ۞ کوشا، سختکوش، ساعی، ماهر
**industriously** /ɪnˈdʌstriəsli/ *adverb*
بە تێکۆشان، بە حەول و تێکۆشان ۞ با سعی و کوشش
**industriousness** /ɪnˈdʌstriəsnəs/ *noun*
حەول، تێکۆشان، کردوکۆش، زەحمەت، رەنج، بەکاری، تێکۆشەری ۞ سعی، کوشایی
**industry** /ˈɪndəstri/ *noun, pl.* industries
1 پیشەسازی، کارسازی، سازکاری 2 خەبات، حەول و تێکۆشان، بەکاری 3 لقێ (کی تایبەتی) لە چالاکی ئابووری یان کارداری (بازرگانی) ۞ 1 صنعت، صناعت 2 سختکوشی 3 ایندastری
**industry-wide** *adjective, adverb*
لە سەرجەم بەشەکانی ئەو پیشەسازییەدا ۞ در کل آن صنعت

**Indy** /ˈɪndi/ *noun*
جۆرێ پێشبرکێی ماشینە تونرەوەکان (بنەڕەت: لە ناوی شاری ئەمریکایی *Indianapolis* پێشبرکێی سەرەکی لەوێ بەرێوە دەچێ) ۞ ایندی
**-ine**[1] /ʌɪn, ɪn, iːn/ *suffix*
پاشگر: 1 (ئاوەڵناو ساز دەکا) سەربە، وەکوو، وەک، یی، ـەکی، سار، شێوە، ی، ئاسا: *canine* 2 ئاوەڵناو ساز دەکا لە ناوی تۆخمەکان gencra و ژێرخێزانەکان subfamilies (وەک *bovine* لە تۆخمی *Bos*) (بنەڕەت: لە *-in, -ine* فەرەنسی، یان لە *-inus* لاتینەوە) ۞ پسوند: (صفتساز) وابسته به، متعلق به، همانند، وش
**-ine**[2] /ʌɪn, ɪn, iːn/ *suffix*
پاشگر: ئاوەڵناو ساز دەکا لە ناوی کانەکان، رووەکەکان و هتد: *crystalline* (بنەڕەت: لە *-inus* لاتین، لە *-inos* یۆنانییەوە) ۞ پسوند: صفتساز
**-ine**[3] /ʌɪn, ɪn, iːn/ *suffix*
پاشگر: ناوی مێیینە ساز دەکا: *heroine* (بنەڕەت: لە فەرەنسەوە، بە ڕێگای *-ina* لاتین لە *-inē* یۆنانی یا لە *-in* ئەڵمانی) ۞ پسوند: اسم مؤنث را میسازد
**-ine**[4] /ʌɪn, ɪn, iːn/ *suffix*
پاشگر: 1 زۆرتر ناوی رووت یا چکۆلینەر ساز دەکا: *medicine, doctrine* 2 (کیمیا) ناوی ئالکالوییدەکان، هالوژێنەکان، ترشەڵۆکە ئەمینۆکان و ماکی تر ساز دەکا: *cocaine*, *chlorine* 3 بەرهەم یان ماکە بازرگانییەکان: *glassine* (بنەڕەت: لە فەرەنسەوە، لە مێیینەی لاتینەوە، لە *-ina* وە) ۞ پسوند: اسمساز
**inebriant** /ɪnˈiːbrɪənt/ *adjective, noun*
*adj* مەستکەر، مەستێنەر *n* خواردنەوەی مەستکەر ۞ *adj* مسکر *n* نوشیدنی مسکر
**inebriate** /ɪˈniːbrɪət/ *adjective, noun*
ئەلکۆلی، ئارەقخۆر، مەست ۞ الکلی، مست
**inebriated** /ɪˈniːbrieɪtɪd/ *adjective*
مەست، کەیل، کەلەلا، سەرخۆش ۞ مست
**inebriation** /ɪˌniːbrɪˈeɪʃn/ *noun*
مەستی، کەیلی ۞ مستی
**inedibility** /ɪnˌedəˈbɪlɪtɪ/ *noun*
نەخوراوی، ناخوری، ناخۆراکیبوون، بەکار خواردن نایە، لەخواردننەهاتوویی ۞ غیرخوراکی بودن
**inedible** /ɪnˈedəbl/ *adjective*
نەخوراو، ناخۆراکی، ناخواردەنی، لەخواردننەهاتوو، ناخوری، بەکارخواردن نایە، بۆ خواردن ناشێ ۞ غیرخوراکی
**ineducability** *noun*
لەپەروەردەنەهاتوویی، فێرنەکراوی ۞ آموزشناپذیری
**ineducable** *adjective*
لەپەروەردەنەهاتوو، فێرنەکراو، فێر ناکرێ ۞ آموزشناپذیر
**ineffability** /ɪnˌefəˈbɪlətɪ/ *noun*
لەوتننەهاتوویی، باسنەکراوی، لەباسنەهاتوویی، نەوتراوی ۞ وصفناپذیری

**ineffable** /ɪn'efəbl/ *adjective*
لەوتن‌نەهاتوو، باس‌نەکراو، لەباس‌نەهاتوو، نەوتراو، یەکجار پیرۆز (کە بۆ باس‌کردن نابێ): *the -fable name of Jehovah* ◌ وصف‌ناپذیر

**ineffably** *adverb*
بە شێوەیەکی لەباس‌نەهاتوو یان نەوتراو ◌ بە طور وصف‌ناپذیر

**ineffaceability** /ɪnɪˌfeɪsə'bɪlɪtɪ/ *noun*
هەرماوی، تیانەچوویی، لەنێونەچوویی ◌ محوناپذیری

**ineffaceable** /ˌɪnɪ'feɪsəbl/ *adjective*
هەرماوی، تیانەچوویی، تیاناچێ، نافەوتێ، لەنێو ناچێ، ناکوژێتەوە، لەنێونەچوویی، ineradicable ◌ محوناپذیر

**ineffaceably** /ˌɪnɪ'feɪsəbli/ *adverb*
لەنێونەچووانە، بە شێوەیێکی تیانەچوو ◌ بە طور محوناپذیر

**ineffective** /ˌɪnɪ'fektɪv/ *adjective*
1 بێ‌ئەنجام، نەزۆک، سەرنەکەوتوو، سەرنەگرتوو، ناکاریگەر 2 لێنەهاتوو، لێنەوەشاو، بێکارە، بەکارنەهاتوو، توانایی‌نەماو، هیچ‌لەدەس‌نەهاتوو، بەیدەس ◌ 1 بی‌نتیجە، غیرمؤثر 2 بی‌عرضە

**ineffectively** /ˌɪnɪ'fektɪvli/ *adverb*
ناکاریگەرانە، بە شێوەیەکی ناکاریگەر ◌ بە طور غیرمؤثر

**ineffectiveness** /ˌɪnɪ'fektɪvnəs/ *noun*
1 ناکاریگەربوون 2 لێنەوەشاوەیی، لێنەهاتوویی، بەکارنەهاتوویی، توانایی‌نەماوی، هیچ‌لەدەس‌نەهاتوویی ◌ 1 غیرمؤثر بودن 2 بی‌کفایتی

**ineffectual** /ˌɪnɪ'fektʃuəl/ *adjective*
1 بێ‌ئەنجام، نەزۆک، سەرنەکەوتوو، سەرنەگرتوو، بێهوودە، ناکاریگەر 2 لێنەهاتوو، لێنەوەشاو، بەکارنەهاتوو، بێکارە، توانایی‌نەماو، هیچ‌لەدەس‌نەهاتوو (ineffectuality *n*) ◌ 1 بی‌نتیجە، غیرمؤثر 2 بی‌عرضە

**ineffectually** /-tʃuəli/ *adverb*
بێ‌ئەنجامانە، ناکەریگەر، بێهوودە ◌ بە طور بی‌نتیجە یا غیرمؤثر

**inefficacious** /ˌɪnefɪ'keɪʃəs/ *adjective*
بێ‌سوود، بێ‌قازانج، بێ‌فایدە، بێ‌بەهرە، هیچ، بێهوودە، بێ‌کەڵک، بەکارنەهاتوو، بێ‌ئەنجام (inefficaciously *adv*) ◌ بی‌فایدە، بی‌خاصیت

**inefficacy** /ɪn'efəkəsɪ/ *noun*
بێ‌سوودی، بێ‌قازانجی، بێ‌فایدەیی، هیچی، بێهوودەیی، بێ‌کەڵکی، بەکارنەهاتوویی، بێ‌ئەنجامی ◌ بی‌فایدگی، بی‌کفایتی، بی‌خاصیتی

**inefficiency** /-ənsi/ *noun, pl.* inefficiencies
1 کەم‌بەرهەمی 2 بەکارنەهاتوویی، لێنەهاتوویی، لێنەوەشاوەیی: *inefficiencies in the system* ◌ 1 بازدهی کم 2 بی‌لیاقتی

**inefficient** /ˌɪnɪ'fɪʃnt/ *adjective*
1 کەم‌بەرهەم 2 بەکارنەهاتوو، ناکارا، بێهوودە، بێ‌بەرهەم، لێنەهاتوو، لێنەوەشاو ◌ 1 کم‌بازدە 2 بی‌اثر، بی‌ثمر، بی‌کفایت

**inefficiently** /ˌɪnɪ'fɪʃntli/ *adverb*
لێنەهاتووانە، لێنەوەشاوانە، بەکارنەهاتووانە ◌ با بی‌کفایتی

**inelastic** /ˌɪnɪ'læstɪk/ *adjective*
1 کێش‌نەهاتوو، نەجیر، ناکێش‌مەند، رەق، کێشی نایە، unyielding ،inflexible 2 (ئابووری، دەربارەی داخوازی یان خستنەبازارەوە) رەق، سەخت، insensitive ،unresponsive (سەبارەت بە گۆران لە نرخ و داهات یان بارودۆخی بازاردا) ◌ 1 بی‌ارتجاع، بدون قوەی ارتجاع، غیرقابل انعطاف 2 انعطاف‌ناپذیر

**inelasticity** /ˌɪnɪlæ'stɪtɪ/ *noun*
کێش‌نەهاتوویی، نەجیری، رەقی ◌ بی‌ارتجاعی، غیرقابلیت انعطاف

**inelastically** *adverb*
کێش‌نەهاتووانە، بە شێوەیێکی رەق ◌ بە طور غیرقابل انعطاف

**inelegance** /ɪn'elɪgəns/ *noun,* also -legancy, *pl.* inelegancies
ناحەزی، ناسەرانج‌راکێشی، ناشیرینی، ناجوانی ◌ نازیبایی

**inelegant** /ɪn'elɪgənt/ *adjective*
ناحەز، ناسەرانج‌راکێش، ناشیرین، ناجوان: *an inelegant phrase* ◊ *an inelegant fall* ◌ نازیبا

**inelegantly** /ɪn'elɪgəntli/ *adverb*
ناحەزانە، بە شێوەیەکی ناحەز ◌ بە طور نازیبا

**ineligibility** /ɪnˌelɪdʒə'bɪləti/ *noun*
لێنەوەشاوەیی، نەشیاوی، بەکارنەهاتوویی، لێنەهاتوویی، پێنەکراوی: *There are many categories of ineligibility for jury service* ◌ عدم صلاحیت

**ineligible** /ɪn'elɪdʒəbl/ *adjective*
لێنەوەشاو، نەشیاو، بەکارنەهاتوو، لێنەهاتوو، پێنەکراو، پەسندنەکراو: *-ble for financial assistance* ◌ فاقد صلاحیت

**ineligibly** *adverb*
لێنەوەشاوانە، نەشیاوانە ◌ بە طور فاقد صلاحیت

**ineluctability** /ˌɪnɪlʌktə'bɪlətɪ/ *noun*
لێ‌دەربازنەبوویی، دووری‌لێ‌نەکراوی، چارەنەهاتوویی، دیاری‌کراوی ◌ اجتناب‌ناپذیری

**ineluctable** /ˌɪnɪ'lʌktəbl/ *adjective*
لێ‌دەربازنەبوو، چارە نییە، ناچاری، هەر دەبێ، ناتوانی لەی دەرباز بی، دووری‌لێ‌نەکراو، چارەنەهاتوو، دیاری‌کراو ◌ اجتناب‌ناپذیر

**ineluctably** /ˌɪnɪ'lʌktəbli/ *adverb*

به شێوەیێ کە ناتوانی خۆتی لێ دوور بگری ◯ به طور اجتناب‌ناپذیر

**ineludible** /ˌɪnɪˈluːdəbl/ *adjective*
چارەنەهاتوو ◯ گریزناپذیر

**inept** /ɪˈnept/ *adjective*
نابەجێ، بێجێ، نەگونجاو، ناڵەبار، هیچ نییە، نەشیاو، لێنەهاتوو، لێنەوەشاو ◯ نامناسب، بی‌مورد، نالایق، ناشایست

**ineptitude** /ɪˈneptɪtjuːd, US -tuːd/ *noun*, also ineptness
بێجێ‌بوون، نابەجێ‌بوون، نەگونجاوی، ناڵەباری، لێنەوەشاوەیی، نەشیاوی، لێنەهاتوویی ◯ بی‌مناسبتی، بی‌لیاقتی، ناشایستگی

**ineptly** /ɪˈneptli/ *adverb*
نەگونجاوانە ◯ به طور نامناسب

**inequality** /ˌɪnɪˈkwɒləti, US s-ˈkwɑːl-/ *noun, pl.* inequalities
1 نابەرامبەری، نایەکسانی، جیاوازی 2 نادادگەری، نارەوایی، نادادپەروەری 3 ناڕێکی، ناتەختی ◯ 1 عدم تساوی، اختلاف 2 بی‌عدالتی 3 ناهمواری

**inequi-** *prefix*
پێشگر: جیاواز، نابەرامبەر، نایەکسان ◯ پیشوند: مختلف، نابرابر

**inequilateral** /ˌɪnekwɪˈlætərəl/ *adjective*
لاجیا، جیالا ◯ مختلف‌الاضلاع

**inequitable** /ɪnˈekwɪtəbl/ *adjective*
نادادگەرانە، ناحەقانە، نادادپەروەرانە، نادادپەروەر، بێئینساف: *-uitable distribution of wealth* ◯ غیرمنصفانه، غیرمنصف

**inequitably** /ɪnˈekwɪtəbli/ *adverb*
نادادگەرانە، ناحەقانە، نادادپەروەرانە، بێئینسافانە ◯ غیرمنصفانه

**inequity** /ɪnˈekwəti/ *noun, pl.* inequities
نادادگەری، ناحەقی، بێخودایی، نادادپەروەری ◯ بی‌انصافی

**ineradicable** /ˌɪnɪˈrædɪkəbl/ *adjective*
لەنێونەچوو، تیانەچوو، ڕەگداکوتاو، بنجداکوتاو، خاشەبڕنەکراو، بنەبڕ ناکرێ، نافەوتێنرێ، ڕیشەکێش ناکرێ ◯ ریشه‌کن‌نشدنی

**ineradicably** /ˌɪnɪˈrædɪkəbli/ *adverb*
لەنێونەچووانە، تیانەچووانە ◯ به طور ریشه‌کن‌نشدنی

**inerasable** /ˌɪnɪˈreɪsəbl/ *adjective*
پاکەوەنەبوو، ناسڕێتەوە، پاناپێتەوە ◯ پاک‌نشدنی

**inerrability** /ɪnˌerəˈbɪlɪtɪ/ *noun*
بێگوناهی، پاکی، گوناهنەکردوویی، (لە)گوناهبەدووری، )خەتانەکردوویی، هەڵەنەکردوویی ◯ معصومیت، خطاناپذیری

**inerrable** /ɪnˈerəbl/ *adjective*
بێگوناه، پاک، گوناهنەکردوو، خەتانەکردوو، (لە)گوناهبەدوور، هەڵەنەکردوو ◯ معصوم، خطاناپذیر

**inerrably** /ɪnˈerəbli/ *adverb*
بێگوناهانە ◯ معصومانه

**inerrancy** /ɪnˈerənsɪ/ *noun*
بێگوناهی، پلکی، گوناهنەکردوویی، (لە)گوناهبەدووری، خەتانەکردوویی، هەڵەنەکردوویی، infallibility ◯ مصونیت از خطا، معصومیت

**inerrant** /ɪnˈerənsɪ/ *adjective*
بێگوناه، گوناهنەکردوو، خەتانەکردوو، (لە)گوناهبەدوور، هەڵەنەکردوو، لەهەڵەنەهاتوو ◯ معصوم، مصون از خطا

**inert** /ɪˈnɜːt, US ɪˈnɜːrt/ *adjective*
1 بێجووڵە، نەبزواو، نەبزۆک، تەکان‌نەخواردوو، چرکەنەکردوو، نەجووڵ 2 (گاز) ناچالاک، بێکاردانەوە، ناکاریگەر، سست 3 سست، تەمەڵ، داوەشاو ◯ 1 بی‌حرکت 2 (گاز) بی‌اثر 3 بی‌حال

**inert gas** *noun*, also noble gas
گازی بێکاردانەوە، گازی سست ◯ گاز بی‌اثر

**inertia** /ɪˈnɜːʃə, US -ɜːrʃə/ *noun*
1 (فیزیک) سستی، ناکاردانەوەیی، ناکاریگەری، ناچالاکی 2 تەمەڵی، سستی، داوەشاوی، خاوی، لەش‌گرانی ◯ 1 لختی 2 بی‌حالی، رخوت

**inertial** /ɪˈnɜːʃl, US ɪˈnɜːrʃl/ *adjective*
(فیزیک) سەربە سستی ◯ وابسته به لختی

**inertial selling** *noun*
ناردنی کەلوپەل بێ‌ڕاسپاردن (بەو هیوایەی کە نەینێرنەوە) ◯ ارسال کالا بدون سفارش

**inertly** /ɪˈnɜːtli, US ɪˈnɜːrtli/ *adverb*
داوەشاوانە ◯ از روی بی‌حالی

**inertness** /ɪˈnɜːtnəs, US ɪˈnɜːrtnəs/ *noun*
داوەشاوی، تەمەڵی، تەپلۆسی، خاوی، سستی ◯ بی‌حالی، تنبلی

**inescapability** /ˌɪnɪskeɪpəˈbɪləti/ *noun*
لێ‌دەربازنەبوویی، دیاریکراوی، دووری‌لێنەکراوی، چارەنەهاتوویی، لێ‌هەڵنەهاتوویی ◯ اجتناب‌ناپذیر

**inescapable** /ˌɪnɪˈskeɪpəbl/ *adjective*
لێ‌دەربازنەبوو، ناچاری، ناتوانی لەی دەرباز بی، دیاریکراو، چارە نییە، دووری‌لێنەکراو، چارەنەهاتوو، لێ‌هەڵنەهاتوو ◯ اجتناب‌ناپذیر

**inescapably** /-əbli/ *adverb*
لێ‌دەربازنەبووانە، چاری ناچار، چارناچار ◯ به طور گریزناپذیر

**inessential** /ˌɪnɪˈsenʃl/ *adjective, noun*
*adj* ناپێویست، زیادی، نەویست *n* شتی زیادی، شتی ناپێویست: *Few people had spare cash for -sentials* ◯ *adj* غیرضروری *n* چیز اضافی

**inestimable** /ɪnˈestɪməbl/ *adjective*

بــێ‌نــەژمار، لــە رادەبــەدەر، گــرانبــایی، لەمەزندەنــەهاتوو، نــرخ بــۆ دیــاری‌نــەکراو ◌ بی‌حساب، غیرقابل برآورد

**inestimably** /ɪn'estɪməbli/ *adverb*
بــە شــێوەیەکی لەمەزندەنــەهاتوو ◌ بــە طــور تخمین‌ناپذیر

**inevitability** /ɪnˌevɪtə'bɪləti/ *noun*
لــێ‌دەربازنــــەبوویی، دیــــاری‌کــــراوی، پــێش‌گــیری‌لــێ‌نــەکراوی، دووری‌لــێ‌نــەکراوی، خۆلێ‌لانەدراوی ◌ اجتناب‌ناپذیری

**inevitable** /ɪn'evɪtəbl/ *adjective, noun*
*adj* لــێ‌دەربازنــــەبوو، دیــــاری‌کــــراو، پــێش‌گــیری‌لــێ‌نــەکراو، دووری‌لــێ‌نــەکراو، خۆلێ‌لانەدراو، نــاتوانی لــەی دەربــاز بی، هــەر روودەدا، هــەر دەبێ، مــسۆگەر، بێ‌ئەملاوئــەولا: *It was an* ◊ *an inevitable outcome n inevitable consequence of the decision* (the inevitable) شتێ کە ناتوانێ لێی دەرباز بی، شــتی لــێ‌دەربازنــەبوو، شــتێ کــە حەتمــەن روودەدا ◌ *adj* اجتناب‌ناپذیر *n* (امر محتوم) امر محتوم

**inevitably** /ɪn'evɪtəbli/ *adverb*
بێ‌ئەملاوئەولا، بە ناچار ◌ حتماً، ناگزیر

**inexact** /ˌɪnɪg'zækt/ *adjective*
نادروست، راست نــیە، ورد نیــە، نــاورد: *an inexact description* ◌ غیردقیق

**inexactitude** /ˌɪnɪg'zæktɪtjuːd, US -tuːd/ *noun*, also inexactness
نادروست، ناوردی، ناراستی: *the inexactitude of economics* ◌ عدم دقت

**inexactly** /ˌɪnɪg'zæktli/ *adverb*
نادروستانە، ناراستانە، ناوردانــە ◌ بــە طــور غیردقیق

**inexcusable** /ˌɪnɪk'skjuːzəbl/ *noun*
بێجێ، نەبەخشراو، نابەخشــرێ، لەپاساونەهاتوو: *inexcusable rudeness* ◌ غیرموجــــــە، توجیەناپذیر، نابخشودنی

**inexcusably** /-əbli/ *adverb*
نەبەخشراوانە، بــە شێوەیەکی نەبەخشــراو ◌ بــە طور نابخشودنی

**inexecutable** *adjective*
جێبــەجێ‌نــەکراو، رانەپــەڕێنراو، رانەپــەڕێ، جێبەجێ نابێ ◌ غیرقابل اجرا

**inexecution** /ɪnˌeksə'kjuʃn/ *noun*
جێبەجێ‌نەبوون، رانەپەڕان ◌ عدم اجرا

**inexertion** /ɪnˌɪg'zɜːʃn/ *noun*
ســــستی، داهێــزراوی، داوەشــاوی، داگیــراوی ◌ بی‌حالی

**inexhaustibility** /ɪnɪgˌzɔːstə'bɪlɪtɪ/ *noun*
1 لــەدوایی‌نــەهاتویی، لــەکۆتایی‌نــەهاتوویی، بێ‌برانــەوەیی، تەواونــەبوویی، لــەبن‌نــەهاتوویی 2 مانــدوویی‌نەناســی ◌ 1 پایــــان‌ناپــــذیری 2 خستگی‌ناپذیری

**inexhaustible** /ˌɪnɪg'zɔːstəbl/ *adjective*
1 لەدوایی‌نەهاتوو، لەکۆتایی‌نەهاتوو، دوایی نایە، لــەبن‌نــەهاتوو، بــێ‌برانــەوە، تەواونــەبوو: *an inexhaustible supply of good jokes* 2 مانــدوویی‌نــەناس، بەتاقــەت ◌ 1 تمــام‌نــشدنی، پایان‌ناپذیر 2 خستگی‌ناپذیر

**inexhaustibly** /ˌɪnɪg'zɔːstəbl/ *adverb*
لەدوایی‌نەهاتووانە، بە شێوەیەکی تەواونــەبوو ◌ به طور تمام‌نشدنی

**inexistence** /ˌɪnɪg'zɪstəns/ *noun*
نەبوون، بوونی نییە ◌ عدم وجود

**inexistent** /ˌɪnɪg'zɪstənt/ *adjective*
نەبوو، نییە ◌ ناموجود

**inexorability** /ɪnˌeksərə'bɪləti/ *noun*
دڵڕەقی، ســەختی، بێ‌بــەزەییتی، بێ‌ڕەحمــی ◌ سنگدلی

**inexorable** /ɪn'eksərəbl/ *adjective*
1 بێ‌وچان، یەکبینە، لەسەریەک، بێ‌وێستان 2 نــەگۆڕ، نــاگۆڕدرێ، نــاتوانی کــاری تێبکــەی، راناگیرێ: *3 the inexorable rise of crime* دڵــڕەق، ســەخت، بــێ‌بــەزەیی، بــێ‌ڕەحــم ◌ 1 بی‌وقفە، مدام 2 تغییرناپذیر 3 بی‌رحم

**inexorably** /ɪn'eksərəbli/ *adverb*
لە رووی دڵڕەقی(یەوە)، دڵڕەقانە، بێ‌بەزەیی‌یانە ◌ از روی سنگدلی

**inexpediency** /ˌɪnɪk'spiːdiəns/ *noun*
سەرچڵی، نەگونجاوی، باش‌نەبوون، بێجێ‌بوون، پێویــــستنــــەبوون، مەســــڵەحەتنــــەبوون ◌ بی‌احتیاطی، نامناسبی، عدم مصلحت

**inexpedient** /ˌɪnɪk'spiːdiənt/ *adjective*
نازیرانــە، بــێ‌ئەقڵانــە، نەشــیاو، نــەگونجاو، بەکارنــەهاتوو، نالــەبار، بــاش نیــە، نادروســت، بێجێ، ناپێویست ◌ نامعقول، نامناسب، غیرمقتضی

**inexpediently** /ˌɪnɪk'spiːdiəntli/ *adverb*
نازیرانــە، بەشــێوەیەکی نــەگونجاو ◌ بــە طــور نامعقول یا نامناسب

**inexpensive** /ˌɪnɪk'spensɪv/ *adjective*
باش، خراپ نییە، هــەرزان، زۆرنەبڕ، کــەم‌خــەرج ◌ مناسب، ارزان

**inexpensively** /ˌɪnɪk'spensɪvli/ *adverb*
بە شێوەیەکی هەرزان ◌ به طور ارزان

**inexpensiveness** /ˌɪnɪk'spensɪvnəs/ *noun*
هــەرزانبــوون، بــاش‌بــوون، کــەم‌خــەرجی، زۆرتێ‌نەچوویی ◌ مناسب بودن، ارزان بودن

**inexperience** /ˌɪnɪk'spɪəriəns, US -'spɪr-/ *noun*
بێ‌ئەزموونی، ناپوختی، خــاوی، قاڵــەونەبوویی ◌ بی‌تجربگی

**inexperienced** /ˌɪnɪk'spɪəriənst, US -

'spɪr-/ *adjective*
بێ‌ئەزموون، خاو، ناپوخت(ە)، بێ‌تەجروبە ◌ بی‌تجربه
**inexpert** /ɪn'ekspɜːt, US -pɜːrt/ *adjective*
ناشارەزا، ناکارامە، لێنەزان، ئاوەکی، ناپوخت، سەرەندەرنەکردوو، ناپسپۆر، بێ‌سەررشتە، ناشارەزایانە ◌ ناوارد، غیرمتخصص، ناشیانە
**inexpertly** /ɪn'ekspɜːtli, US -pɜːrt/ *adverb*
ناشارەزایانە، بێ‌سەررشتانە، ناشیانە ◌ ناشیانە
**inexpertness** /ɪn'ekspɜːtnəs, US -pɜːrt/ *noun*
ناشارەزایی، سەرەندەرنەکردوویی ◌ ناوارد بودن
**inexpiable** /ɪn'ekspɪəbl/ *adjective*
1 لەقەرەبوونەهاتوو، بە هیچ شێوەیێ تاوانەکەی نادرێتەوە، سەخت، گران 2 ناسرێتەوە، لەنێو ناچێ، تیاناچێ ◌ 1 کفارەناپذیر 2 از بین‌نرفتنی
**inexpiableness** /ɪn'ekspɪəblnəs/ *noun*
کەفارەهەڵنەگری، لەقەرەبوونەهاتوویی، سەختی، گرانی ◌ کفارەناپذیری
**inexpiably** /ɪn'ekspɪəbli/ *adverb*
سەختانە، بە شێوەیەکی لەقەرەبوونەهاتوو ◌ بە طور کفارەناپذیر
**inexplicability** /ɪnɪkˌsplɪkə'bɪlɪti/ *noun*
روون(ەوە)نەکراوی، لێکەوەنەدراوی، لەروونکردنەوەنەهاتوویی، سەیربوون ◌ تبیین‌ناپذیری، توضیح‌ناپذیری
**inexplicable** /ˌɪnɪk'splɪkəbl/ *adjective*
روون(ەوە)نەکراو، لێکەوەنەدراو، لێک نادرێتەوە، روون ناکرێتەوە، لەروونکردنەوەنەهاتوو، ئاڵۆز، لێ‌تێنەگەیشتوو، سەیر: *an inexplicable* ◊ *disappearance For some inexplicable* ◌ *reason he gave up a fantastic job*
تبیین‌ناپذیر، توضیح‌ناپذیر، بغرنج
**inexplicably** /ˌɪnɪk'splɪkəbli/ *adverb*
بە شێوەیەکی لێکەوەنەدراو یان سەیر ◌ بە طور توضیح‌ناپذیر
**inexplicit** /ˌɪnɪk'splɪsɪt/ *adjective*
ناروون، ناڕۆشن، نائاشکرا، نادیار ◌ غیرصریح، غیرواضح
**inexplicitly** /ˌɪnɪk'splɪsɪtli/ *adverb*
نائاشکرایانە ◌ بە طور غیرصریح
**inexplicitness** /ˌɪnɪk'splɪsɪtnəs/ *noun*
نائاشکرایی، ناڕاشکاوی، ناروونی، ناڕۆشنی، نادیاری ◌ عدم صراحت، عدم وضوح
**inexplorable** *adjective*
لەدۆزینەوەنەهاتوو، نەدیتراو ◌ اکتشاف‌ناپذیر
**inexplosive** /ˌɪnɪk'spləʊsɪv/ *adjective*
لەتەقینەوەنەهاتوو، نەتەقیو ◌ غیرقابل انفجار
**inexpressibility** /ɪnɪkˌspresə'bɪlɪti/ *noun*
لەدەربڕیننەهاتوویی، نەوتراوی، لەوتننەهاتوویی، لەباسنەهاتوویی، باسنەکراوی ◌ غیرقابلیت بیان، وصف‌ناپذیری
**inexpressible** /ˌɪnɪk'spresəbl/ *adjective*
لەدەربڕیننەهاتوو، نەوتراو، لەوتننەهاتوو، لەباسنەهاتوو، باسنەکراو، دەرنابڕێ، ناوترێ، باس ناکرێ ◌ غیرقابل بیان، وصف‌ناپذیر
**inexpressibly** /ˌɪnɪk'spresəbli/ *adverb*
بە شێوەیەکی باسنەکراو ◌ بە طور وصف‌ناپذیر
**inexpressive** /ˌɪnɪk'spresɪv/ *adjective*
تێنەگەیێنەر، نادەربڕ، دەرنەبڕ، بێ‌واتا، (هیچ)پیشاننەدەر ◌ بی‌احساس، غیربیانگر
**inexpressively** /ˌɪnɪk'spresɪvli/ *adverb*
بە شێوەیەکی تێنەگەیێنەر، دەرنەبڕانە ◌ بە طور بی‌احساس
**inexpressiveness** /ˌɪnɪk'spresɪvnəs/ *noun*
نادەربڕی، دەرنەبڕی، بێ‌واتایی ◌ بی‌احساس بودن
**inextensibility** /ɪnɪkstensə'bɪlɪti/ *noun*
لەکشاننەهاتوویی، نەکشاوی ◌ انبساط‌ناپذیری
**inextensible** /ˌɪnɪk'stensəbl/ *adjective*
لەکشاننەهاتوو، نەکشاو ◌ انبساط‌ناپذیر
**in extenso** /ˌɪn ɛk'stɛnsəʊ/ *adverb*
(لاتین) بە دوور و درێژی، بە چڕوپڕی ◌ مفصلاً
**inextinct** *adjective*
نەکوژاوە، لەنێونەچوو، تیانەچوو ◌ خاموش‌نشدە
**inextinguishable** /ˌɪnɪk'stɪŋgwɪʃəbl/ *adjective*
1 لەکوژانەوەنەهاتوو، نەکوژاوە، ناکوژێتەوە، دانەمرکاو، دانامرکێ، داگیرساو، کڵپەکردوو 2 هەمیشەیی، لەنێونەچوو، هەرماو، نەمر، کوێرەوەنەبوو ◌ 1 خاموش‌نشدنی، فرونشاندنی 2 جاودانە
**inextinguishably** /ˌɪnɪk'stɪŋgwɪʃəbli/ *adverb*
بە شێوەیەکی نەکوژاوە ◌ بە طور خاموش‌نشدنی
**in extremis** /ˌɪn ɪk'striːmɪs/ *adverb*
1 (لاتین، لە کڵێسەی کاتۆلیکدا) لە سەرەمەرگدا، نزیک بە مردن 2 لە کاتی تەنگەتاویدا ◌ 1 در شرف مرگ 2 در مواقع اضطراری
**inextricability** /ˌɪnɪkstrɪkə'bɪləti, US ɪnˌekstrɪkə'bɪləti/ *noun*
لێک‌جیانەکراوی، لێک‌دانەبڕاوی، لەدابڕاننەهاتوویی، لێکەوەنەبوویی، پێکەوەبەستراوی ◌ تفکیک‌ناپذیر
**inextricable** /ˌɪnɪk'strɪkəbl, US ɪn'ekstrɪkəbl/ *adjective*
1 لێک‌جیانەکراو، لێک جیاناکرێتەوە، لێک‌دانەبڕاو، لەدابڕاننەهاتوو، لێکەوەنەبوو، پێکەوەبەستراو، پێکەوەگرێدراو: *Knowledge and economic power have become* 2 *-le*
لێ‌دەربازنەبوو، چارەسەرنەکراو، بێ‌چارەسەر،

بێ‌دەرەتان، بێ‌دەروو ◌ 1 تفکیک‌ناپذیر 2 لاینحل

**inextricably** /ˌɪnɪk'strɪkəbli, US ɪn'ekstrɪkəbli/ *adverb*
لێک‌جیانەکراوانە، بە شێوەیەکی لێک‌دانەبڕاو: *Europe's foreign policy is inextricably linked with that of the US* ◌ بە طور تفکیک‌ناپذیر

**inf** *abbreviation* infra

**infallibility** /ɪnˌfælə'bɪləti/ *noun*
هەڵەنەکردوویی، هەڵەنەکەری، خەتانەکردوویی، لەهەڵەبەدووری، گوناەپێنەکراوی: *papal infallibility* ◌ خطاناپذیری

**infallible** /ɪn'fæləbl/ *adjective*
1 هەڵەنەکردوو، هەڵەنەکەر، هەڵە ناکا، بێ‌بەری لە گوناە، خەتانەکردوو، لەهەڵەبەدوور، گوناەپێنەکراو: *an infallible method of memorizing things* 2 جێی‌باوەڕ، لێ‌ڕاپێنراو ◌ 1 خطاناپذیر 2 مطمئن

**infallibly** /-əbli/ *adverb*
هەڵەنەکردووانە، بە شێوەیەکی هەڵەنەکردوو ◌ بە طور خطاناپذیر

**infamous** /'ɪnfəməs/ *adjective*
1 شەرماوی، ناحەز، شووروەیی، ناشیرین، ئابڕووبەرە، نەنگ، عەیب، disgraceful: *an infamous crime* 2 ڕووڕەش، نێوزڕاو، ئابڕووتکاو، ڕووسیابار، بێ‌ئابڕوو، نێودەرکردوو: *a general who was infamous for his brutality* ◊ *an infamous traitor* ◌ 1 ننگین، رسواکننده 2 رسوا، بدنام

**infamously** /'ɪnfəməsli/ *adverb*
بە ڕووڕەشی ◌ با رسوایی

**infamy** /'ɪnfəmi/ *noun, pl.* infamies
نێوزڕاوی، ئابڕووتکاوی، بێ‌ئابڕوویی، ڕووڕەشی، ڕووسیاباری، خوێڕیەتی، سووکی ◌ بدنامی، رسوایی، فرومایگی

**infancy** /'ɪnfənsi/ *noun, pl.* infancies
1 منالی، ساوایی، زارۆکی 2 سەردەمی منالی 3 قۆناخی هەڵدان یان پەرەسەندن، سەروبەند یان سەردەمی دەس‌پێکردن، قۆناخی سەرەتا 4 (ماف) سەغیری، کەم‌تەمەنی (خوار 18 ساڵ) ◌ 1 کودکی 2 دوران کودکی 3 مرحلەی ابتدایی 4 (حقوق) صغر

**infant** /'ɪnfənt/ *noun, adjective*
*n* 1 منال، منداڵ، کۆرپە، زارۆک، ساوا، منالی بەرمەمکان یان شیرەخۆرە، منداڵی مەمکەخۆرە 2 (ماف) سەغیر، کەم‌تەمەن 3 (وەکوو ئاوەڵناو) لە یەکەمین قۆناخی پەرەسەندنیدا *adj* منالانە ◌ *n* 1 کودک 2 صغیر 3 در نخستین مرحلەی رشد *adj* کودکانە

**infanta** /ɪn'fæntə/ *noun*
(مێژوویی) شازادە، شاکچ (هی شا یان شاژن، سپانیا و پۆرتوگال) ◌ شاهدخت

**infante** /ɪn'fænteɪ/ *noun*
(مێژوویی) شازادە، شاکوڕ (هی شا یان شاژن، سپانیا و پۆرتوگال) ◌ پسر شاه

**infanteer** /ˌɪnf(ə)n'tɪə/ = infantryman

**infanticidal** /ɪnˌfæntɪ'saɪdl/ *adjective*
سەربە منال‌کوژی ◌ وابستە بە نوزادکشی

**infanticide** /ɪn'fæntɪsaɪd/ *noun*
منال‌کوژی، بنیادەمی منال‌کوژ ◌ نوزادکشی، آدم نوزادکش

**infantile** /'ɪnfəntaɪl/ *adjective*, archaic term for infantile
1 منالانە، سەربە منالان یان (سەردەمی) منالی 2 سەرەتایی ◌ 1 کودکانە، وابستە بە کودکان یا کودکی 2 ابتدایی

**infantile paralysis** *noun*, also poliomyelitis
(کۆن) شەپلەی منالان ◌ فلج اطفال

**infantilism** /ɪn'fæntɪlɪzəm/ *noun*
1 هەڵنەدان، منال‌مانەوە (لەباری لەش و هۆشەوە) 2 هەڵس‌وکەوت یان ڕەفتاری منالانە ◌ 1 کودک‌ماندگی 2 رفتار بچگانە

**infant mortality** *noun*
مردنی منالان (لەژێر ساڵێکەوە) ◌ مرگ‌ومیر کودکان

**infant mortality rate** *noun*
ڕادەی مردنی منالان ◌ میزان مرگ‌ومیر کودکان

**infant prodigy** *noun*
منالی هەڵکەوتوو ◌ کودک نابغە

**infantry** /'ɪnfəntri/ *noun, pl.* infantries
سپای پیادە؛ تیپ regiment یا لەشکری division پیادە ◌ پیادەنظام؛ انفتری

**infantryman** /'ɪnfəntrimən/ *noun, pl.* infantrymen
سەربازی سپای پیادە، سپایی پیادە، سەربازی پیادە ◌ سرباز پیادەنظام

**infant school** *noun*
خوێندنگای منالان ◌ مدرسەی آمادگی

**infarct** /'ɪnfɑːkt, US ɪn'fɑːkt/ *noun*
شوێنێ کە لەبەر ڕاوێستانی خوێنەوە، شانەکەی مردبێ ◌ انفارکت

**infarction** /ɪn'fɑːkʃn, US -'fɑːrk-/ *noun*
وێستانی دڵ، دڵەکێ ◌ سکتەی قلبی

**infatuation** /ɪnˌfætʃu'eɪʃn/ *noun*
سەوداسەری، شێت‌وشەیدابوون، دڵـڕفاوی، دلبەستەیی، ئەویـنداری، دڵ‌تێچوون ( infatuated /ɪn'fætʃueɪtɪd/ *adj*) ◌ شیفتگی، شیدایی

**infauna** /'ɪnfɔːnə/ *noun*
ئەو گیانەوەرانەی کە لە نیشتووەکانی بنکی ئۆقیانووس، ڕووبار یان گۆماوەکاندا دەژین

(پروانه epifauna؛ **infaunal** *adj*) ۞ این‌فونا

**infeasible** /ɪnˈfiːzəbl/ *adjective*
نەکرد، لەکردن‌نەهاتوو، جێبەجێ‌نەکراو، ناکرێ، (impracticable **infeasibility** /ɪnˌfiːzəˈbɪləti/ *n*) ۞ غیرعملی

**infected** /ɪnˈfektɪd/ *adjective*
1 چلک‌کردوو، تووش‌بوو، دوچاربوو، گرتوو، پێوەبوو، تێوەدراو 2 (کامپیوتێر) تووش‌بوو (بە ڤایرۆس) ۞ 1 عفونی، مبتلا، آلوده 2 انفکتد

**infection** /ɪnˈfekʃn/ *noun*
1 تووش‌بوون، گرتن، تەنینەوە، گرتنەوە، گواستنەوە، دوچاربوون 2 چلک‌کردن، هەوکردن، ئاوەدزکردن، نەخۆشی چلک 3 پیسی، تێوەدراوی، پیس‌کردن، تێوەدان 4 کاریگەری، شوێن‌دانان، کارتێ‌کردن، باندۆر ۞ 1 ابتلا، سرایت 2 عفونت، بیماری عفونی 3 آلودگی، آلودەسازی 4 تأثیر، اثر

**infectious** /ɪnˈfekʃəs/ *adjective*, also **infective** /ɪnˈfektɪv/
1 چلکی 2 بگرەوە، پەرۆک، بەتەشەنە، تەشەنەدار، درم، پەتا 3 تووش‌بوو، دوچاربوو (**infectiously** /ɪnˈfekʃəsli/ *adv*: بە شێوەیەکی بگرەوە، پەرۆکانە؛ **infectiousness** /ɪnˈfekʃəsnəs/ *n*: گرتنەوە، داکەوتن، بەتەشەنەیی، تەشەنەکردن) ۞ 1 عفونی 2 واگیردار 3 مبتلا

**infectious hepatitis** = hepatitis A

**infectious mononucleosis** *noun*, also **glandular fever**
تای لوویی: جۆرێ نەخۆشی چلکی سەخت، بەهۆی ڤایرۆسی Epstein-Barr کە تا، ماسی رژێنە لەشاوییەکان lymph nodes و lymphocytosis لە نیشانەکانیەتی ۞ تب غده‌ای

**infecund** /ɪnˈfiːkənd/ *adjective*
بێ‌بەر، بێ‌بەرهەم، بێ‌حاسڵ (**infecundity** /ˌɪnfɪˈkʌndɪti/ *n*: بێ‌بەرهەمی، بێ‌حاسڵی) ۞ بی‌حاصل

**infelicific** *adjective*
سەرەخۆرە، نگریس، شووم، بەدشوم ۞ منحوس

**infelicitous** /ˌɪnfəˈlɪsɪtəs/ *adjective*
ناڵەبار، نەگونجاو، نەشیاو، لێنەوەشاو: *an infelicitous remark* ◊ *an infelicitous moment* (**infelicitously** *adv*) ۞ نامناسب، نالایق

**infelicity** /ˌɪnfəˈlɪsɪti/ *noun, pl.* infelicities
1 ناڵەباری، نەگونجاو بوون، پێنجێ‌بوون، قسەی ناڵەبار 2 (کۆن) نەهامەتی، نەگبەتی، نەهاتی، بێ‌بەختی، نگریسی، شوومی، بێ‌ودمی ۞ 1 نامناسب بودن، سخن نامناسب 2 بدبختی، شومی

**inference** /ˈɪnfərəns/ *noun*
1 هەڵێنجان، پێ‌بردن، بۆدەرکەوتن، ئەنجام‌گیری: *to draw/make inferences from the data* 2 ئەنجام، پێشاژۆ ۞ 1 استنباط، استنتاج 2 نتیجه

**inferential** /ˌɪnfəˈrenʃəl/ *adjective*
ئەنجام‌گیری‌یانە، ئیستنباتی (**inferentially** *adv*: (بە شێوەیەکی) ئەنجام‌گیری‌یانە) ۞ استنتاجی، استنباطی

**inferior** /ɪnˈfɪəriə(r), US -ˈfɪr-/ *adjective, noun*
1 *adj* نزم(تر)، خوار(تر)، خواردەس، ژێردەس، پایەنزم 2 خراپ، بازاری، نەباش، ئاپەخ، رەشۆکی: *inferior goods* ◊ *of inferior quality* ◊ *Modern music is often considered inferior to that of the past* 3 (پزشکی) شوێنی خوار یان خواروو 4 (رووەک‌ناسی، سەربە هێلکەدانی گوڵێ) لە بنەوەی sepal هەڵکەوتووە *n* مرۆ یان بنیادەمی ژێردەست یان پایەنزم ۞ 1 *adj* پایین(تر)، دون‌پایه 2 نامرغوب، پست 3 و 4 انفریور *n* آدم دون‌پایه

**inferior court** *noun*
دادگای سەرەتایی ۞ دادگاه ابتدایی

**inferiority** /ɪnˌfɪəriˈɒrəti, US -ˌfɪriˈɔːr-, -ˈɑːr-/ *noun*
خۆبەکەم‌زانی، خۆبەکەم‌دانان، چکۆلەیی، ژێردەس‌بوون، پایەنزمی: *a sense of inferiority* ۞ حقارت، خودکم‌بینی، زیردست بودن

**inferiority complex** *noun*
گرێ(ک)ی خۆبەکەم‌زانی، کامپلێکسی خۆبەکەمی یا خۆبەکەم‌گرتن ۞ عقده‌ی حقارت

**inferiority feeling** *noun*
هەستی خۆبەکەم‌زانی یان خۆبێ‌کەمی ۞ احساس حقارت

**infernal** /ɪnˈfɜːnl, US ɪnˈfɜːrnl/ *adjective*
1 جەهەنمی، دۆزەخی، دۆژەیی: *the infernal regions* 2 شەیتانی، خراپ 3 ناحەز، ناشیرین 4 بنیادەم شێت دەکا (**infernally** *adv*: (بە شێوەیێکی) شەیتان‌ئاسا) ۞ 1 جهنمی 2 شریر 3 شنیع 4 اعصاب‌خردکن

**infernality** /ɪnfɜːˈnælɪti, US ɪnˈfɜːrnælɪti/ *noun*
جەهەنمی بوون، شەیتانێتی، خراپ‌بوون، شەیتان‌ئاکاری ۞ جهنمی بودن، شیطان‌صفتی

**inferno** /ɪnˈfɜːnəʊ, US ɪnˈfɜːrnoʊ/ *noun, pl.* infernos
1 (خوازە) جەهەنم، دۆزەخ، دۆژە، شوێنی جەهەنم‌ئاسا (ئاماژە بە Dante's *Divine Comedy*) 2 ئاوری گەورە و پڕمەترسی، سووتمان، یەک‌پارچە ئاور ۞ 1 جهنم 2 آتش بزرگ و خطرناک

**infertile** /ɪnˈfɜːtaɪl, US ɪnˈfɜːrtl/ *adjective*
1 بێ‌پیت، بێ‌بەرهەم، بێ‌بڕشت 2 نەزۆک،

3 *an infertile couple* : پەیچەڵ، ئەستێور، قسر
بایەر، نازەنوێر، بێبرشت، بێمایە، بێبەرهەم،
بێبەرەکەت
**infertility** /ˌɪnfɜːˈtɪləti, US -fɜːrˈt-/ *n* : بێپیتی، بێبەرهەمی، بێبرشتی،
نازەنوێری) ◌ 1 نابارور 2 عقیم 3 لم‌یزرع،
بی‌حاصل

**infestant** *noun*
هوروزژم‌بردوو، تێمرۆکاو ◌ مهاجم

**infestation** /ˌɪnfeˈsteɪʃn/ *noun*
(مێروو و هتد) هوروزژم، تێمرۆکان، تێوروزژان،
تێدان، هەڵکوتانەسەر، تەپدانەسەر: *an infestation of lice* ◊ *Scientists are checking for both insect and fungal infestation* (infester *n*) ◌ هجوم

**infibulation** *noun*
کوێراندنەوە، گیرەبەندکردن: بڕینی میتکە و
لێوەکانی شەرمی ژن یا کچ و پێکەوەدوورینی،
تا نزیکی لەگەڵ نەکرێ (بنەڕەت: لە لاتینییەوە
*infibulare*, *infibulat-* "بەستن بە گیرە،
گیرەوبەست") ◌ انفیبولاسیون

**infidel** /ˈɪnfɪdəl/ *noun, adjective*
(کۆن) *n* کافر، زەندیق، دینەدڕ، بەدئایین،
بێئایین، بێدین *adj* کفراوی ◌ *n* کافر، بی‌دین
*adj* کفرآمیز

**infidelity** /ˌɪnfɪˈdeləti/ *noun, pl.* infidelities
1 کافری، بێئایینی، بێدینی، بەدئایینی، دینەدڕی،
کفر 2 پەیمانشکێنی، بێبەڵێنی، خەیانەت،
بێوەفایی، زینا (لە ژن‌ومێردایەتیدا): *She could not forgive his infidelities* ◌ 1
کافری، کفر 2 نقض عهد، خیانت

**infield** *noun*
کێڵگە یان زەوی نزیک بەماڵی جووت‌بەند(ە)
◌ اینفیلد

**infighting** /ˈɪnfaɪtɪŋ/ *noun*
رقەبەری، رقەبەرایەتی، پێشبڕکێی توند(وتیژ)
یان دەستەویەخە، شەڕی دەستەویەخە:
◊ *political infighting within the party*
*bureaucratic infighting* ◌ رقابت تنگاتنگ،
نبرد تن به تن

**infill** /ˈɪnfɪl/ *noun,* also infilling
1 (قوڕەکاری) پڕکردنەوە: *infill development*
2 (شت) پڕکەرەوە، ناوپڕ، پڕەک: *gravel infill*
◌ 1 درزگیری 2 مصالح درزگیری

**infiltration** /ˌɪnfɪlˈtreɪʃn/ *noun*
1 تەشەنە، دزە(کردن)، چوونەنێو، پیاڕۆیشتن،
پیانێپەڕین: *the infiltration of rain into the soil* 2 پالاوتن (بە دەڵاندن) 3 (پزشکی)
پالاوتنی مەتریاڵێ یان کۆمەڵە خانەیێ ◌ 1
رخنه، نفوذ 2 پالایش 3 انفلتراسیون

**infiltrator** /ˈɪnfɪltreɪtə(r)/ *noun*
مرۆی دزەون یا دزەتێکەر، سیخوڕ ◌ آدم نفوذی

**in fine** /ɪn ˈfʌɪni, US ˈfiːneɪ/ = finally

**infinite** /ˈɪnfɪnət/ *adjective, noun*
1 *adj* بێدوایی، بێکۆتایی، دیارینەکراو،
بێسنوور، بێبن، بێدووماهی، لە رادەبەدەر،
بێئەژمار، لە ئەندازەبەدەر، بێڕادە: *an infinite variety of plants* ◊ *an infinite universe* ◊ *a teacher with infinite patience* 2 (ڕێزمان)
نەگەردانی *n* (the infinite) خودا ◌ 1 *adj*
بی‌پایان، بی‌کران، نامحدود، لایتناهی 2 (دستور
زبان) اینفینیت *n* (the infinite) خداوند

**infinitely** /ˈɪnfɪnətli/ *adverb*
بێئەندازە، لە رادەبەدەر، یەکجار زۆر: *Human beings are infinitely adaptable* ◊ *Your English is infinitely better than my German* ◌ بی‌نهایت

**infiniteness** *noun*
دیارینەکراوی، بێسنووری، لە ئەندازەبەدەری،
بێکۆتایی ◌ نامحدود بودن، بی‌پایانی

**infinitesimal** /ˌɪnfɪnɪˈtesɪml/ *adjective*
کەم، هیچەکە، چکۆلە: *an infinitesimal risk* ◊ *an infinitesimal difference* ◊ *infinitesimal traces of poison* ◌ اندک، ناچیز

**infinitesimal calulus** = calculus

**infinitesimally** /-məli/ *adverb*
بە شێوەیەکی کەم ◌ به طور اندک

**infinitival** /ˌɪnfɪnɪˈtaɪv(ə)l/ *adjective*
چاوگی، ژێدەری، چاوکەیی، سەربە چاوگ یان
ژێدەر ◌ مصدری

**infinitivally** *adverb*
لە باری چاوگی یان ژێدەرییەوە، چاوگییانە
◌ از لحاظ مصدری

**infinitive** /ɪnˈfɪnətɪv, US ɪnˈfɪnɪtɪv/ *noun, adjective*
*n* چاوگ، چاوکە، ژێدەر، رادەر *adj* چاوگی،
ژێدەری، سەربە چاوگ، چاوکەیی
(infinitively *adv*) ◌ *n* مصدر *adj* مصدری

**infinitude** /ɪnˈfɪnɪtjuːd/ *noun*
1 دیارینەکراوی، بێکۆتاییتی، بێسنووریتی، لە
رادەبەدەری، بێئەندازەیی، بێئەژماری 2 ژمارە
یان بڕێکی زۆر ◌ 1 نامحدودی، بی‌کرانی،
لایتناهی بودن، بی‌پایانی 2 عده یا مقدار نامحدود

**infinity** /ɪnˈfɪnəti/ *noun, pl.* infinities
1 دیارینەکراوی، بێکۆتاییتی، بێڕادەیی،
بێسنووریتی، بێبنی، لە رادەبەدەری،
بێئەندازەیی، بێئەژماری: *the infinity of space*
2 ژمارە یان بڕێکی زۆر ◌ 1 *infinities*
نامحدودی، بی‌کرانی 2 عده یا مقدار نامحدود

**infirm** /ɪnˈfɜːm, US ɪnˈfɜːrm/ *adjective*
1 پێچوو، بێهێز، بێشیان، تێکچڕژاو، کز،
بەککەوتە، لاواز، سست، خاو و خلیچک، لەق،
لۆق، شل‌وشەویق، ناتوند، ناجێگیر، ناچەسپیو 2
باوەڕپێنەکراو، لێڕانەبینراو، جێی متمانە نییە

(infirmly *adv*: بـه لاوازی) ۞ 1 ضـــعیف، عاجز، متزلزل، بی‌ثبات 2 نامعتبر

**infirmarer** /ɪnˈfɜːm(ə)rə/ *noun*
(مێژوویی) بەرپرسی نەخۆشخانە لە دەیری سەدەکانی نێوەڕاستدا ۞ انفرمارر

**infirmary** /ɪnˈfɜːməri, US -ˈfɜːrm-/ *noun, pl.* infirmaries
1 نەخۆشخانە 2 دیو یا ژووری نەخۆشەکان ۞ 1 بیمارستان 2 اتاق بیماران

**infirmity** /ɪnˈfɜːməti, US -ˈfɜːrm-/ *noun, pl.* infirmities
لاوازی، بێهێزی، پێچووی، سستی، عەیب، کەموکوڕی: *We all fear disability or infirmity* ۞ ضعف، نقطه‌ضعف

**infix** /ˈɪnfɪks/ *noun*
(ڕێزمان) نێوگر، نێوبەند، ناوبەند ۞ میان‌وند

**in flagrante delicto** /ɪn fləˌgranteɪ dɪˈlɪktəʊ, US fləˌgranti/ *adverb*
1 لە کاتی کردنی تاواندا 2 لە کاتی بەسەرەوە گرتندا (لەگەڵ کەسێکی تر) ۞ 1 در حین ارتکاب جرم 2 در حین هم‌خوابگی

**inflamed** /ɪnˈfleɪmd/ *adjective*
سوورەوەبوو، هەڵتۆقیو، هەڵبوو، تووڕە(بوو): *an inflamed and swollen finger* ◊ *an inflamed crowd* ۞ ملتهب، برافروخته، برآشفته

**inflammability** /ɪnˌflæməˈbɪləti/ *noun*
1 (زوو)گڕگرتوویی، زووگرتوویی، سووتەنێتی، زووسووتی، ئاورگرتوویی، داگیرساوی 2 زووتووڕەیی، هەڵتیزۆکی، زووبزواوی، زوو وروژاوی، توندخوویی ۞ 1 اشتعال‌پذیری 2 زودانگیختگی

**inflammable** /ɪnˈflæməbl/ *adjective*
1 (زوو)گڕگرتوو، داگیرساو، سووتەنی، زووسووت، ئاورگرتوو، زوو دەیگری، زووگرتوو: *inflammable material* 2 زووتووڕە، زووبزواو، هەڵتیزۆک، زوو وروژاو، توندخوو ۞ 1 اشتعال‌پذیر 2 زودانگیخته، عصبی

**inflammably** /ɪnˈflæməbli/ *adverb*
بە شێوەیەکی (زوو)گڕگرتوو، ئاورگرتووانە، زووگرتووانە، زووسووتانە ۞ به طور اشتعال‌پذیر

**inflammation** /ˌɪnfləˈmeɪʃn/ *noun*
1 سووربوونەوە، سووتانەوە، هەوکردن، ئاوسان: *a cream to reduce* ◊ *-mation of the ear* 2 گڕگرتن، داگیرسان، گرتن، هەڵگیرسان، وروژاندن، بزواندن، داگیرساندن *the -tion* ۞ 1 التهاب، آماس 2 اشتعال، تهییج

**inflammatory** /ɪnˈflæmətri, US -tɔːri/ *adjective*
1 بزوێنەر، هاندەرانە، ئاژاوەنەرەوە، داگیرسێنەر، وروژێنەر: ◊ *-matory remarks* 2 *inflammatory language* (پزشکی) دەبێتە هۆی ئاوسان یان سووربوونەوە، ئاوسان یان سووربوونەوە دەگرێتەوە، سوورەوەبوو (inflammatorily *adv*) ۞ 1 تحریک‌آمیز، فتنه‌انگیز 2 ملتهب

**inflatable** /ɪnˈfleɪtəbl/ *adjective*
باتێکراو، بادی، بایی، بای تێدەکرێ، فووتێکراو ۞ قابل باد کردن

**inflated** /ɪnˈfleɪtɪd/ *adjective*
1 پڕبا، باتێکراو، فووپڕاو، هەڵماساو، هەڵپفاو، ئەستووربوو، پەنەمیاو 2 هەڵاوساو: *inflated prices/salaries* ۞ 1 بادشده، ورم‌کرده 2 تورمی

**inflation** /ɪnˈfleɪʃn/ *noun*
1 هەڵاوسان، ئاوسان، گرانی: *the fight against rising inflation* ◊ *to control/curb inflation* ◊ *Wage increases must be in line with inflation* ◊ *to reduce/bring down inflation* 2 باتێکردن، فوودان، هەڵماساندن، هەڵپفاندن، ماسین، باکردن: *life jackets with an automatic inflation device* ۞ 1 تورم 2 باد کردن، ورم، نفخ

**inflationary** /ɪnˈfleɪʃənri, US -neri/ *adjective*
ئاوسانی، هەڵاوسانی، سەربە گرانی: *the inflationary wage demands* ◊ *inflationary effects of price rises* ۞ تورمی

**inflationary gap** *noun*
کەلێن یان بۆشایی هەڵاوسان ۞ شکاف تورمی

**inflationary pressure** *noun*
گوشار یان سەنگی هەڵاوسان ۞ فشار تورمی

**inflationary spiral** *noun*
پێچاوپێچی هەڵاوسان ۞ مارپیچ تورم

**inflationism** *noun*
(هەڵ)ئاوسانگەری ۞ تورم‌گرایی

**inflationist** *noun, adjective*
*n* (هەڵ)ئاوسانگەر *adj* (هەڵ)ئاوسانگەرییانە، سەربە یان پێوەندی بە (هەڵ)ئاوسانگەرییەوە هەیە ۞ *n* تورم‌گرا *adj* تورم‌گرایانه

**inflected** *adjective*
گەردانکراو: *an inflected form/verb* ◊ *an inflected language* ۞ تصریفی

**inflection** /ɪnˈflekʃn/ *noun,* (chiefly Brit. inflexion)
1 گەردان(کردن) 2 گۆڕان (لە دەنگدا) 3 وشەی گەردانکراو، ئامرازی گەردان، پیت (ی گەردان) 4 چەماندنەوە، نووشتاندنەوە، چەماوی، نووشتانەوە ۞ 1 صرف 2 تغییر 3 صورت صرف‌شده 4 خم کردن، انحنا

**inflectional** *adjective*
گەردانی، سەربە یان پێوەندی بە گەردانەوە هەیە ۞ صرفی

**inflectionless** *adjective,* also inflexionless

گەردان‌نەکراو، لەگەردان‌نەهاتوو، بێ‌گەردان ◌ صرف‌نشدنی

**inflective** /ɪnˈflektɪv/ *adjective*
گەردان‌کراو، لەگەردان‌هاتوو ◌ قابل صرف

**inflexed** *adjective*
بادراو، نووشتاو، چەمیو، پێچ‌دراو ◌ خمیده

**inflexibility** /ɪnˌfleksəˈbɪləti/ *noun*
سەختی، دانەهاتوویی، وشکی، رەقی، نەنووشتێنراوی، لەچەمانەوەنەهاتوویی، نەنەرمی، نەگۆڕی، کەللەڕەقی، سەرسەختی ◌ خشکی، سفت، انعطاف‌ناپذیری، تغییرناپذیری

**inflexible** /ɪnˈfleksəbl/ *adjective*
سەخت، دانەهاتوو، وشک، رەق، نەنووشتێنراو، نانووشتێنەوە، ناچەمێتەوە، لەچەمانەوەنەهاتوو، نەنەرم، نەگۆڕ، کەللەڕەق، سەرسەخت، لەسەرسوور ◌ خشک، سفت، انعطاف‌ناپذیر، تغییرناپذیر

**inflexibly** /-əbli/ *adverb*
نەگۆڕانە، بە شێوەیێکی نەگۆڕ ◌ به طور تغییرناپذیر

**inflexion** = inflection

**inflexional** = inflectional

**inflexionless** = inflectionless

**inflictable** /ɪnˈflɪktəbl/ *adjective*
دانەسەپاو، لەداسەپان‌نەهاتوو، بەسەریدا ناسەپێ ◌ غیرقابل تحمیل

**infliction** /ɪnˈflɪkʃn/ *noun*
1 داسەپاندن، (بە زۆر) لەسەردانان، وەشاندن، (تێ)سرەواندن، لێدان، پیاکێشان، پێدان، پیادان 2 سزا ◌ 1 تحمیل، واردآوری 2 کیفر

**inflight** *adjective*
لەکاتی فڕین‌دا، بە درێژایی فڕین ◌ درحین پرواز

**inflorescence** /ˌɪnflɔːˈrɛs(ə)ns, US -flə-/ *noun*
1 (رووەک‌ناسی) بار و رێکخستنی گوڵ، هێشووەگوڵ، ئینفلۆرێسێنس (بریتین لە: 1 raceme 2 corymb 3 umbel 4 compound umbel 5 capitulum 6 spike 7 compound spike 8 panicle 9 cyme) 2 گوڵ‌کردن، پشکوتن ◌ 1 گل‌آذین 2 شکوفایی

**inflow** /ˈɪnfləʊ, US -floʊ/ *noun*
گوربوون، لێژبوونەوە، بۆ نێوەچوون، تێرژان، لێشاو ◌ جاری شدن

**influence** /ˈɪnfluəns/ *noun*
1 دەسداری، دەس‌ڕۆیشتوویی، باوەڕی، کەلێز، هێز، دەسەلات: *Her parents no longer have any real influence over her* 2 کاریگەری، باندۆر، کارتێ‌کردن: *the influence of the climate on agricultural production* ◊ *cultural -luences* ◌ 1 نفوذ، قدرت 2 اثر، تأثیر

**influent** /ˈɪnfluənt/ *adjective, noun*
1 نێوڕێژ، بۆ ناوەوەرژاو 2 لاچۆم، زێ ◌ 1 داخل‌ریز 2 رود فرعی

**influential** /ˌɪnfluˈenʃl/ *adjective*
1 دەسدار، بەتوانا، دەس‌ڕۆیشتوو، بەدەس، جێی‌باوەڕ، دەس‌درێژ، بەدەسەلات، بەبایەخ، بەقەدر 2 کاریگەر، بەباندۆر، کارتێکەر، دیاری‌کەر: *a highly influential book* ◌ 1 بانفوذ، متنفذ 2 مؤثر، باتأثیر

**influentially** /ˌɪnfluˈenʃli/ *adverb*
دەس‌ڕۆیشتووانە ◌ به طور بانفوذ

**influenza** /ˌɪnfluˈenzə/ *noun*
ئانفلوئانزا، پەرکەم، پەتا (بە هۆی سێ تەووشی orthomyxovirus دەبێ: *Influenzavirus A* و *Influenzavirus B* *Influenzavirus C* زۆرتر بە پێتی گەورە بۆ ئاماژە بە یەکێ لەم سیانە بەکاردێتێ) ◌ آنفلوآنزا

**influenzal** /ˌɪnfluˈenzəl/ *adjective*
ئانفلوئانزایی، پەرکەمی، پەتایی ◌ وابسته به آنفلوآنزا

**influx** /ˈɪnflʌks/ *noun*
گوربوون، هەڵقولین، لێژبوونەوە، بۆ نێوەچوون، تێرژان، رژانەنێو، لێشاو: *the influx of wealth into the region* ◌ جاری شدن

**info** /ˈɪnfəʊ, US ˈɪnfoʊ/ *abbreviation*
information

**infomercial** /ˌɪnfəʊˈmɜːʃl, US ˌɪnfoʊˈmɜːrʃl/ *noun*
ئینفۆمێریسیاڵ (بنەڕەت: تێکەڵەی information + commercial) ◌ انفومرسیال

**informal** /ɪnˈfɔːml, US ɪnˈfɔːrml/ *adjective*
1 نافەرمی، نارەسمی، بێ‌داب‌ودەستوور، بێ‌دیدی‌وبۆدی، ئاسایی، تایبەتی، خۆمانە، دۆستانە، سادە، ناڕواڵەتی، ناڕووکەشی 2 (زمان، ئاخافتن و نووسین) نێو خەڵک، رەمەکی ◌ 1 غیررسمی، دوستانه، بدون تشریفات، عادی، غیرصوری 2 محاوره‌ای

**informality** /ˌɪnfɔːˈmæləti, US -fɔːrˈm-/ *noun, pl.* informalities
1 نافەرمی‌بوون، بێ‌داب‌ودەستووری، خۆمانەیی، خۆمانەبوون، رەچاونەکردنی داب‌ودەستوور 2 هەڵس‌وکەوتی خۆمانە یان بێ‌داب‌ودەستوور ◌ 1 غیررسمی بودن، عدم تشریفات 2 رفتار غیررسمی

**informally** /ɪnˈfɔːməli, US -ˈfɔːrm-/ *adverb*
نافەرمی‌یانە، بە شێوەیێکی نافەرمی: *to dress informally* ◌ به طور غیررسمی

**informal vote** *noun*
(ئەوسترالیا) دەنگی نافەرمی یان بێ‌بایەخ ◌ رأی بدون اعتبار

**informant** /ɪnˈfɔːmənt, US -ˈfɔːrm-/ *noun*
1 ئاگایی‌دەر، ئاگادەر، زانیاری‌دەر، سیخوڕ 2 (زمانەوانی) قسەپێکەر، ئاخێوەر ◌ 1

آگاهی‌دهنده، مخبر 2 گویشور
**informatics** /ˌɪnfəˈmætɪks, US ˌɪnfər-/ *noun, pl.*
ئینفۆرماتیک، زانیاری‌ناسی ◌ انفورماتیک
**information** /ˌɪnfəˈmeɪʃn, US ˌɪnfərˈm-/ *noun*
1 ئاگایی، ئاگامەنی، ئاگاداری، ئاگا، زانیاری، پەیام 2 راستی‌یەکان، فاکتەکان 3 تاوانبارکردن، گوناهبارکردن، تۆمەتبارکردن، راگەیاندنی تاوان ◌ 1 اطلاعات، اطلاع، خبر 2 واقعیات 3 اتهام
**informational** /-ʃənl/ *adjective*
پـڕ(لـە)زانیـاری، زانیـاری تیایـە، پـڕئاگایی (informationally *adv*) ◌ متضمن آگاهی
**information centre** *noun*
ناوەندی زانیاری، ناوەند یان نێوەندی ئاگایی ◌ مرکز اطلاعات
**information media** *noun, pl.*
دەزگاکانی راگەیاندن ◌ وسایل اعلام
**information overload** *noun*
سەرباری زانیاری ◌ اضافه‌بار اطلاعات
**information retrieval** *noun*
(کامپیوتێر) دەس‌خستنەوەی زانیاری، گێڕانەوەی ئاگامەنی ◌ بازیابی اطلاعات
**information science** *noun*
زانستی زانیاری یان ئاگامەنی، زانیاری‌ناسی، ئینفۆرماتیک (= زانستی کۆکردنەوە، ڕیکخستن، هەلگرتن و ناردنی زانیاری) ◌ علم اطلاعات
**information superhighway** *noun*
ئینتێرنێت، گەورەڕێی زانیاری ◌ بزرگ‌راه اطلاعات
**information technology** *noun*
تێکنۆلۆژی زانیاری ◌ فناوری اطلاعات
**information theory** *noun*
بیردۆز یان تیۆری زانیاری ◌ نظریه‌ی اطلاعات
**informative** /ɪnˈfɔːmətɪv, US -ˈfɔːrm-/ *adjective*, also informatory /ɪnˈfɔːmət(ə)ri/
پـــڕزانیاری، ئاگـــایی‌پێـــدەر، ئاگـــایی‌دەر، instructive ◌ آموزنده
**informatively** /ɪnˈfɔːmətɪvli, US -ˈfɔːrm-/ *adverb*
پڕزانیاری‌یانە، ئاگایی‌پێدەرانە، ئاگایی‌دەرانە ◌ به طور آموزنده
**informed** /ɪnˈfɔːmd, US ɪnˈfɔːrmd/ *adjective*
1 ئاگـادار، بـەئاگا، خەبـەردار، لـەگۆڕێ‌دابـوو: 2 ئاگادارانـە، بەئاگایانـە، *informed sources* ئاگامەندانە ◌ 1 مطلع، در جریان 2 آگاهانه
**informer** /ɪnˈfɔːmə(r), US -ˈfɔːrm-/ *noun*
سـیخور، ئاگـا(یـی)دەر (ب.ت. بـۆ پـارە) ◌ جاسوس
**infotainment** /ˌɪnfəʊˈteɪnmənt, US ˌɪnfoʊ-/ *noun*
بەرنامەیێ کە هەر دوو باری سەرقالی و زانیاری تیابـــێ (تێکـــەلانـــدنی information + entertainment) ◌ انفوتاینمنت
**infotrch** = information technology
**infra** /ˈɪnfrə/ *adjective*
(لاتـین) لـە ژێـرەوە، لـە خـوارەوە، خـوارتر، *for additional examples see infra* :below ◌ در زیر، پایین‌تر
**infra-** /ˈɪnfrə/ *prefix*
پێشگر: ژێر، خوار، بن: *infrasonic* (بنـەڕەت: لە *infra* لاتین) ◌ پیشوند: فرو، مادون
**infra-axillary** *adjective*
ژێرهەنگڵی، ژێرباخڵی ◌ زیربغلی
**infraclass** *noun*
(زیندەوەرناسی) ژێرلاپۆل؟: بابەتێکی پۆلاندن کە دەکەوێتە خوارووی subclass ◌ اینفراکلاس
**infraclavicular** *adjective*
ژێرچەنەمەیی ◌ زیرترقوه‌ای
**infracostal** /ˌɪnfrəˈkɒstl/ *adjective*
ژێرپەراسوویی ◌ زیردنده‌ای
**infraction** /ɪnˈfrækʃn/ *noun*
(ماف) شکاندن، پێشێل‌کردن، سەرپێچی، ملبادان، یاساشکێنی، قانوونبەزێنی: *minor infractions of EU regulations* (infractor *n*: پێشێل‌کار، سـەرپێچ، مـلبـادەر، یاساشـکێن، قـانوونبـەزێن، قانوونشکێن) ◌ تخطی، نقض، عدول
**infradian** /ɪnˈfreɪdɪən/ *noun*
(کارئەندامناسی) کـەمتر لـە جارێـک لـە ڕۆژدا دووبـارە دەبێتـەوە (لـەگـەل ultradian بـەراوردی بکە) ◌ اینفرادین
**infra dig** /ˌɪnfrə ˈdɪg/ *adjective, Latin*
سووک، مایەی سـووکایەتی (بنـەڕەت: لـە *infra dignitatem*) ◌ دون شأن
**infra dignitatem** = infra dig
**inframaxillary** *adjective*
سەربە شەویلکەی خوارەوە، ژێرشـەویلکەیی ◌ وابسته به آرواره‌ی زیرین
**infrangible** /ɪnˈfran(d)ʒɪb(ə)l/ *adjective*
1 پـیرۆز، جێـی‌رێـز، پێـشێل‌نـەکراو، نەبـەزێنراو، دەبێ بپـارێزرێ، پـارێزراو 2 نەشـکێن، ناشـکێ، ورد نابێ ◌ 1 مصون، تخلف‌ناپذیر 2 نشکستنی
**infrared** /ˌɪnfrəˈred/ *noun, adjective*
ژێرسوور: *an infrared ◊ infrared radiation lamp* ◌ فروسرخ، مادون قرمز
**infrared spectrum** *noun*
شەبەنگی ژێرسوور ◌ طیف فروسرخ
**infrarenal** *adjective*
ژێرگورچیلەیی ◌ زیرکلیه‌ای
**infrascapular** *adjective*
ژێرشانی، سەربە ژێری شان ◌ زیرکتفی
**infrasonic** *adjective*

ژێردەنگی ۞ فروصوتی

**infrasound** *noun*

شەپۆلە دەنگی‌یەکانی ژێردەنگ ۞ امواج صوتی فروصوت

**infrasternal** *adjective*

سەربە خوارەوەی کوڵەی سنگ، ژێرکوڵەیی ۞ زیرجناغی

**infrastructural** /ˌɪnfrəˈstrʌktʃərəl/ *adjective*

ژێرخانی، ژێربیناتی، ژێرپێکهاتەیی، سەربە ژێرخان: *-ructural development* ۞ زیربنایی

**infrastructure** /ˈɪnfrəstrʌktʃə(r)/ *noun*

ژێرخان، ژێربنیات، ژێرپێکهاتە (ئابووری، سیستم و خزمەتگوزاری بنەرەتی وەک ڕێگاوبان، گواستنەوە، دابینکەری کارەبا و ئاو) ۞ زیربنا

**infratemporal** *adjective*

ژێرلاجانگی ۞ زیرشقیقه‌ای

**infrequency** /ɪnˈfriːkwənsɪ/ *noun*

کەم‌ڕووداوی، بە دەگمەن ڕوودان ۞ ندرت وقوع

**infrequent** /ɪnˈfriːkwənt/ *adjective*

کەم، کەم‌ڕووداو، دەگمەن، چۆنها، جارناجار: *her infrequent visits home* ۞ نادر، گاه‌گاهی

**infrequently** /ɪnˈfriːkwəntli/ *adverb*

بە دەگمەن، جارجار، کەم: *This happens not infrequently* ۞ ندرتاً

**infringement** /ɪnˈfrɪndʒmənt/ *noun*

1 شکاندن، بەزاندن، پێشێل‌کردن، سەرپێچی، مل‌بادان، یاساشکێنی، قانوونبەزێنی 2 دەس‌درێژی ۞ 1 قانون‌شکنی، تخطی 2 تجاوز

**infringer** *noun*

1 پێشێل‌کەر، یاساشکێن، قانوونشکێن، قانوونبەزێن 2 دەس‌درێژکەر ۞ 1 نقض‌کننده 2 تجاوزکننده

**infructuous** *adjective*

بێ‌بەر، بێ‌بەرهەم، بێهوودە ۞ بی‌ثمر، بی‌حاصل

**infundibular** /ˌɪnfʌnˈdɪbjʊlə(r)/ *adjective*, also infundibuliform

سەربە infundibulum، ڕەحەتی‌ئاسا، شێوەڕەحەتی، شێوەکوڤک ۞ وابسته به infundibulum قیفی‌شکل

**infundibulum** /ˌɪnfʌnˈdɪbjʊləm/ *noun, pl* infundibula /-ˈdɪbjʊlə/

(توێکاری و گیانەوەرناسی) بۆشایی یان پێکهاتەی ڕەحەتی‌ئاسا، ڕەحەتی، کوڤک ۞ حفره یا ساختار قیفی‌شکل

**infuriated** *adjective*

ڕق‌هەستاو، بەردبەباکەر، (زۆر) تووڕە ۞ عصبانی، برآشفته

**infuriating** /ɪnˈfjʊərieɪtɪŋ, US -ˈfjʊr-/ *adjective*

نارەحەت‌کەر، تووڕەکەر، ڕق‌هەستێن: *an infuriating child/delay* ۞ عصبانی‌کننده

**infuriatingly** /ɪnˈfjʊərieɪtɪŋli, US -ˈfjʊr-/ *adverb*

بە شێوەیەکی ڕق‌هەستێن، تووڕەکەرانە: *to smile infuriatingly* ۞ به طور عصبانی‌کننده‌ای

**infusibility** /ɪnˌfjuːzəˈbɪlɪti/ *noun*

لەتوانەوەنەهاتوویی، شلەوەنەبوویی، نەتواوەیی، لەشلەوەبوون‌نەهاتوویی ۞ غیرقابلیت ذوب

**infusible**[1] /ɪnˈfjuːzəbl/ *adjective*

لەتوانەوەنەهاتوو، شلەوەنەبوو، ناتوێتەوە، نەتواوە، شل نابێتەوە، لەشلەوەبوون‌نەهاتوو ۞ غیرقابل ذوب

**infusible**[2] /ɪnˈfjuːzəbl/ *adjective*

لەدەم(کردن)هاتوو، لەخووساندن‌هاتوو، دەم‌کراو، دەم‌دێنی، شیاوی تێکردن، تێدەکرێ ۞ دم‌کردنی، قابل تزریق

**infusion** /ɪnˈfjuːʒn/ *noun*

1 خووساندن، دەم‌کردن، خستنەئاو، داڕشتن 2 گیراوەی دەم‌کراو (زۆرتر وەکوو دەرمان دەخوری) 3 داکوتاندن، چێ‌خستن، چاندن، تێکردن (بە ئەسپایی) ۞ 1 عمل دم‌کردن 2 محلول دم‌کرده 3 القا، تزریق

**infusive** /ɪnˈfjuːsɪv/ *adjective*

تێکەر ۞ تزریق‌کننده

**-ing**[1] *suffix*

پاشگر: 1 ئاماژە بە چالاکی، ئەنجام و بەرهەم یان کار و کردەوەیەکی کار(ی) verbal: *sleeping running building* 2 ئاماژە بە ماک و کەرستەیێ material کە بۆ ڕەوت و پرۆسەیێ لە کار دەکرێ یان بەشداری لەودا دەکا: *piping* 3 ناوی کار gerund ساز دەکا (وەک *painting* لە *I love painting*؛ بنەڕەت: لە *-ung* ،*-ing* ئینگلیسی کۆن، لە بنەڕەتا ئەڵمانی) ۞ پسوند: 1 اشاره به فعالیت، نتیجه و حاصل یا عمل (فعلی) 2 اشاره به مصالح کار 3 اسم را می‌سازد

**-ing**[2] *suffix*

پاشگر: 1 ناوی کارا یان ناوەڵناوی کارایی present participle کارەکان verbs ساز دەکا: *calling* 2 ناوەڵناو لە ناو ساز دەکا: *hulking* (بنەڕەت: ئینگلیسی نێوەڕاست، گۆڕاوی *ende* سەرەتا، پاشان *-inde*) ۞ پسوند: 1 اسم فاعل یا صفت فاعلی را می‌سازد 2 صفت را از اسم می‌سازد

**-ing**[3] *suffix*

پاشگر: سەربە، پێوەندی هەیە، لە جۆری، خاوەنی تایبەتمەندی‌یێ: *gelding ,farthing* *whiting ,shilling* (بنەڕەت: ئینگلیسی کۆن، لە بنەڕەتا ئەڵمانی) ۞ پسوند: وابسته به، از نوع، دارای خاصیت

**ingenious** /ɪnˈdʒiːniəs/ *adjective*

داهێنەر، بەهۆش، چارەدۆز، چارەساز، زیرەک، داهێنەرانە، شارەزایانە، وەستایانە، لێزانانە،

زیرەکانە، inventive ،clever ◌ خلاق، ابتکاری، ماهرانه

**ingeniously** /ɪnˈdʒiːniəsli/ *adverb*
داهێنەرانە، چارەدۆزانە، زیرەکانە، شارەزایانە ◌ خلاقانه، ماهرانه

**ingénue** /ˈænʒemjuː, US ˈændʒənuː/ *noun*
(فیلم یان شانۆنامە) کچی (بێ)گوناهی کەنیشکی سادە ◌ دختر معصوم

**ingenuity** /ˌɪndʒəˈnjuːəti, US -ˈnuː-/ *noun, pl.* ingenuities
1 بەهۆشی، چارەدۆزی، داهێنان 2 زیرەکی، شارەزایی، دەس‌ڕەنگینی، هونەرمەندی، وەستایی، کارزانی ◌ 1 ابتکار 2 زیرکی، مهارت

**ingenuous** /ɪnˈdʒenjuəs/ *adjective*
1 سادە، بێ‌قەلەودەلە، بێ‌گرێ‌وگۆڵ، بێ‌فڕوفێڵ، لەڕوو، بێ‌پێچ‌وپەنا، بێ‌ڕیا، پاک، ڕێک‌وڕاست 2 بێ‌ئەزموون، چاونەکراوە، ساویلکە ◌ 1 صاف و ساده، بی‌تزویر 2 ساده‌لوح

**ingenuously** /ɪnˈdʒenjuəsli/ *adverb*
لە ڕووی سادەیی(یەوە) ◌ از روی سادگی

**ingenuousness** /ɪnˈdʒenjuəsnəs/ *noun*
سادەیی، بێ‌قەلەودەلەیی، بێ‌فڕوفێڵی ◌ سادگی، بی‌تزویری

**ingestion** /ɪnˈdʒesʃn/ *noun*
قوت‌دان، گرتن، مژین ◌ بلع، قورت، جذب

**ingestive** /ɪnˈdʒestɪv/ *adjective*
قوت‌دەر ◌ بلعنده، قورت‌دهنده

**ingle** /ˈɪŋgl/ *noun*
ئاوری مەنقەڵ یان کوانوو یان گاز ◌ آتش منقل یا اجاق

**inglenook** /ˈɪŋglnʊk/ *noun*
(بۆ دانیشتن) لە پاڵ ئاگرداندا، لە تەنیشت ئاگرداندا ◌ کنار بخاری

**inglorious** /ɪnˈglɔːriəs/ *adjective*
1 ئابڕووبەرانە، سووک، شەرماوی، جێی‌شەرم، نەنگ، دزێو، *an inglorious defeat* :shameful 2 نەناس، نەناسراو (ingloriously *adv*: ئابڕووبەرانە، بە شێوەیەکی ئابڕووبەرە) ◌ 1 خفت‌بار 2 ناشناخته

**ingloriousness** /ɪnˈglɔːriəsnəs/ *noun*
ئابڕووبەرەیی، نەنگی، شەرماوی‌بوون ◌ خفت‌باری

**ingoing** *adjective*
ژوورەوەهاتوو، تازەهاتوو ◌ واردشونده، تازه‌وارد

**ingot** /ˈɪŋgət/ *noun*
دارشتە، قورسە، کەستەک (ب.ت. زێڕ یان زیو) ◌ شمش

**ingrain** /ˈɪngreɪn/ *adjective*
نەچنراو ڕەنگ‌کراو ◌ این‌گرین

**ingrained** /ɪnˈgreɪnd/ *adjective*, also engrained
1 ڕەگ‌داکوتاو، لێونەبوو، نەگۆڕ، پنج‌داکوتاو، داکوتراو 2 تەواو، ڕەبەق، هەمەلایەنە 3 بواردوو ◌ 1 ریشه‌دار 2 کامل 3 به خورد چیزی رفته

**ingrate** /ˈɪngreɪt, US ɪnˈgreɪt/ *noun, adjective*
*n* (وێژەیی) بنیادەمی سپڵە یان بێ‌چاوڕوو، مرۆی پێنەزان *adj* سپڵە، بێ‌سەفەت، پێنەزان، بێ‌چاوڕوو ◌ *n* آدم نمک‌نشناس *adj* نمک‌نشناس

**ingratiating** /ɪnˈgreɪʃieɪtɪŋ/ *adjective*
زمان‌لووس، زمان‌لووسانە، نەرمەبڕانە، pleasing، *an ingratiating smile* :flattering ◌ چاپلوس، چاپلوسانه

**ingratiatingly** /ɪnˈgreɪʃieɪtɪŋli/ *adverb*
زمان‌لووسانە، نەرمەبڕانە، بە زمان‌لووسی ◌ چاپلوسانه

**ingratitude** /ɪnˈgrætɪtjuːd, US -tuːd/ *noun*
پێنەزانی، بێ‌ئەمەکی، سپڵەیی، بێ‌سەفەتی، بێ‌چاوڕوویی، ناسپاسی: *Her help was met with ingratitude and unkindness* ◌ نمک‌نشناسی، ناسپاسی

**ingredient** /ɪnˈgriːdiənt/ *adjective*
1 بەش(ەکان)، بەشی پێکهێنەر یان دروسکەر، شتێ کە دەچێتە نێو ئاوێتەیێ یان بەشێکی پێکهێنەری هەر لێکدان یات تێکەڵەیێکە، (ingredients) بەشەکان، بەشە constituent 2 پێکهێنەرەکان 3 ژوورەوەهاتوو، ژوورەوەچوو، شتێ کە دێتە ژوورەوە یان نێوەوە ◌ 1 جزء، جزء ترکیبی 2 (در جمع) اجزا 3 داخل‌شونده

**ingress** /ˈɪngres/ *noun*
1 چوونەژوورەوە، چوونەنێوەوە 2 ماف یان دەستووری چوونەژوورەوە ◌ 1 دخول، ورود 2 اجازه‌ی ورود

**ingression** *noun*
چوونەژوورەوە، چوونەنێوەوە ◌ دخول

**ingressive** /ɪnˈgresɪv/ *adjective*
نێوەوەچوو، ژوورەوەچوو (ingressively *adv*) ◌ داخل‌شونده

**in-group** *noun*
داروودەستە ◌ باند

**ingrowing** /ˈɪngrəʊɪŋ, US -groʊ-/ *adjective*
(نینۆک) لە گۆشت هەڵچەقیو، چووە نێو گۆشتەکەوە ◌ فرورفته در گوشت

**ingrown** /ˈɪngrəʊn/ *adjective*
1 (نینۆک) لە گۆشت هەڵچەقیو، چووە نێو گۆشتەکەوە 2 خۆماکی، سروشتی، زاتی، زگماکی ◌ 1 فرورفته در گوشت 2 ذاتی، فطری

**ingrowth** /ˈɪngrəʊθ/ *noun*
هەڵدان یان ڕووان لە نێو شتێکی ترا، هەڵدانی لەنێوەوە ◌ رشد یا رویش درونی

**inguinal** /ˈɪŋgwɪn(ə)l/ *adjective*
(تویکاری) سەربە بن یان بێخی ران، سەربە تەراد، سەربە سەرووی ران یان بەرمەولدان (بنەڕەت: لە *inguinalis* لاتین، لە *inguen* "groin") ◌ وابسته به کشالەی ران

**ingurgitation** /ɪnˌgɜːdʒɪˈteɪʃn/ *noun*
قوتدان ◌ بلع

**Ingush** /ˈɪŋgʊʃ/ *noun, pl.* same or Ingushes
1 ئەندامی گەلێ کە زۆربەیان لە کۆماری ئینگوش، ناوچەیێ لە کەوکازی ناوەندیدا دەژین 2 زمانی کەوکازی باکووری ئەو گەلە ◌ اینگوش

**inhabitability** /ɪnˌhæbɪtəˈbɪlətɪ/ *noun*
لەدانیشتن‌هاتوویی، لەژیوارهاتوویی ◌ قابلیت سکونت

**inhabitable** /ɪnˈhæbɪtəbl/ *adjective*
لەدانیشتن‌هاتوو، لەژیوارهاتوو، بۆ ژیوار دەبێ، ژیانی لێ دەکرێ ◌ قابل سکونت

**inhabitancy** /ɪnˈhæbɪtənsɪ/ *noun,* also inhabitation /ɪnˌhæbɪˈteɪʃn/
ژیان تیاکردن، دانیشتن، ئاوەدان‌کردنەوە، گیرسانەوە ◌ سکونت

**inhabitant** /ɪnˈhæbɪtənt/ *noun*
1 ژیوارتیاکردوو، دانیشتووی، جێواری 2 (inhabitants) دانیشتووان، ئاواییان، جێواران ◌ 1 ساکن، اهل 2 (در جمع) سکنه، اهالی

**inhabited** /ɪnˈhæbɪtɪd/ *adjective*
ئاوەدان، لێ‌دانیشتوو، ئاوا: *The island is no longer -ited* ◌ مسکونی

**inhalant** /ɪnˈheɪlənt/ *adjective, noun*
*adj* 1 بۆ هەلمژین 2 هەلمژ *n* دەرمانی هەلمژین ◌ *adj* 1 تنفسی 2 استنشاق‌کننده *n* داروی تنفسی

**inhalation** /ˈɪnhəˈleɪʃn/ *noun*
هەلمژین، هەناسەهەلکێشان، هەناسەوەرگرتن ◌ استنشاق

**inhalational** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە inhalation ـەوە هەیە ◌ استنشاقی

**inhalator** *noun*
پرژێنەی هەلمژین ◌ افشانەی تنفسی

**inhaler** /ɪnˈheɪlə(r)/ *noun*
پرژێنەی هەلمژین ◌ افشانەی تنفسی

**inharmonic** /ˌɪnhɑːˈmɒnɪk/ *adjective,* also inharmonical /ˌɪnhɑːˈmɒnɪkl/
نەگونجاو، ڕێک‌نەکەوتوو، یەک‌نەکەوتوو، ناکۆک، نەساز، not harmonic ◌ ناهماهنگ، ناسازگار

**inharmonious** /ˌɪnhɑːˈməʊnɪəs, US -hɑːrˈmoʊ-/ *adjective*
(پێکەوە)نەگونجاو، ناکوک، نەسازاو، یەک‌نەگرەوە، ناجۆر، ڕێک‌نەکەوتوو، یەک‌نەکەوتوو، conflicting ،discordant: *-onious personalities* ◌ ناهماهنگ، ناسازگار

**inharmoniously** /ˌɪnhɑːˈməʊnɪəslɪ, US -hɑːrˈmoʊ-/ *adverb*
نەگونجاوانە، بە شێوەیەکی ناکۆک ◌ بە طور ناهماهنگ

**inharmoniousness** /ˌɪnhɑːˈməʊnɪəsnəs, US -hɑːrˈmoʊ-/ *noun*
(پێکەوە)نەگونجاوی، ڕێک‌نەکەوتوویی، یەک‌نەکەوتوویی، یەک‌نەگرتنەوە، پێکدژی، ناکۆکی، نەسازاوی، ناجۆری، پێکەوەکارنەکردوویی ◌ ناهماهنگی، ناسازگاری

**inharmony** *noun*
نەگونجاوی، ڕێک‌نەکەوتوویی، یەک‌نەکەوتوویی، یەک‌نەگرتنەوە، پێکدژی، ناکۆکی، نەسازاوی، discord ◌ ناهماهنگی، ناسازگاری

**inhaul** /ˈɪnhaʊl/ *noun,* also inhauler
(دەریاوانی) گوریسی بادەوەکێش ◌ ریسمان بادبان‌کش

**inherence** /ɪnˈhɪərəns, -ˈher-, US -ˈhɪr-/ *noun,* also inherency
خۆماکی‌بوون، زاتی‌بوون، سروشتی‌بوون ◌ ذاتی بودن

**inherent** /ɪnˈhɪərənt, -ˈher-, US -ˈhɪr-/ *adjective*
خۆماکی، زاتی، خۆیی، سروشتی، لێکەوەنەبوو، جیاوەنەبوو، لێک نابێتەوە، لێک‌دانەبڕاو، ڕەگ‌داکوتاو، intrinsic: *risks inherent in the venture* ◊ *Violence is inherent in our society* ◌ فطری، ذاتی، لاینفک

**inherently** /ɪnˈhɪərəntlɪ, -ˈher-, US -ˈhɪr-/ *adverb*
خۆماکییانە، بە شێوەیەکی زاتی، خۆی لە خۆیدا ◌ ذاتاً

**inheritability** *noun,* also inheritableness
لێوەشاوەیی یان توانایی بۆماوەیی هەیە ◌ قابلیت توارث

**inheritable** *adjective*
1 لێوەشاوە یان دەتوانێ بۆی بمێنێتەوە، دەتوانێ لە باو و باپیرەوە بۆی بەجێمێنێ 2 بۆی هەیە بۆی بمێنێتەوە، بۆی هەیە بە میرات بۆی بمێنێتەوە، مافی میرات‌وەرگرتنی هەیە، دەشێ وەک میرات بۆی بمێنێتەوە: *an inheritable title* ◌ 1 قابل توارث 2 میراث‌بردنی

**inheritance** /ɪnˈherɪtəns/ *noun*
1 بۆماوە، ڕشتارە، ڕێزارە، ڕژارە، ڕژتارە 2 کەلەپوور، میرات، بەش، شتێ کە ماوەتەوە یان بەجێماوە: *our cultural inheritance* 3 میرات‌بردن، میرات‌وەرگرتن، بە میرات بۆمانەوە ◌ 1 توارث، وراثت 2 میراث 3 میراث‌بری

**inheritance tax** *noun*
باجی میرات، میراتانە، کەلەپوورانە ◌ مالیات بر

ارث

**inheritor** /ɪnˈherɪtə(r)/ *noun*
بەشبەر، میراتبەر، میراتگر ◯ وارث

**inheritress** *noun, fem.* inheritor, also inheritrix /ɪnˈherɪtrɪks/
بەشبەر، میراتگر (ژن) ◯ وارثە

**inhesion** /ɪnˈhiːʒən/ = inherence

**inhibited** /ɪnˈhɪbɪtɪd/ *adjective*
خۆ دەخواتەوە، مات، پێش‌خواردوو، کەم‌ڕوو ◯ درخود فرورفتە

**inhibition** /ˌɪnhɪˈbɪʃn, US ˌɪnɪˈb-/ *noun*
نەهێشتن، بەرگرتن، پێش‌گرتن، ڕێ‌گرتن، نەهێلان، بەربەندی، گێڕانەوە: *the inhibition of growth* ◯ بازداری، منع، نهی

**inhibitor** /ɪnˈhɪbɪtə(r)/ *noun*
ڕێگر، پێشگر، بەربەند، گێڕەوە، کۆسپ، بەرسینگ ◯ بازدارندە، مانع

**inhibitory** /ɪnˈhɪbɪtrɪ, US tɔːrɪ/ *adjective,* also inhibitive
ڕێگر، پێشگر، بەربەند، گێڕەوە ◯ بازدارندە

**inhomogeneity** *noun*
ناهاوڕەگەزی، ناهاوتوخمی، ناچونیەکی، ناهاوجۆری، نایەک‌ڕەنگی، نایەک‌جۆری، ناهاوشێوەیی ◯ نامتجانس بودن، ناهمگنی

**inhomogenous** /ˌɪnhɒmə(ʊ)ˈdʒiːnɪəs, ˌɪnhəʊm-, -ˈdʒen-/ *adjective*
ناهاوڕەگەز، ناهاوتوخم، ناچونیەک، ناهاوجۆر، نایەک‌ڕەنگ، نایەک‌شێوە، نایەک‌جۆر، ناهاوشێوە ◯ نامتجانس، ناهمگن

**inhospitable** /ˌɪnhɒˈspɪtəbl, US ˌɪnhɑːˈs-/ *adjective*
1 بەخیل، دەس‌قووچاو، پیسکە، بەرچاوتەنگ، میوان‌نەگر 2 ناخۆش، بێ‌پەنا: *an inhospitable environment* ◊ *an inhospitable terrain* ◊ *an inhospitable climate* (inhospitableness *n*) ◯ 1 خسیس 2 نامساعد

**inhospitably** /ˌɪnhɒˈspɪtəblɪ, US ˌɪnhɑːˈs-/ *adverb*
بەخیلانە، دەس‌قووچاوانە، میوان‌نەگرانە ◯ خسیسانە

**inhospitality** /ˌɪnhɒspɪˈtælɪtɪ/ *noun*
بەرچاوتەنگی، دەس‌قووچاوی، میوان‌نەگری ◯ بخل، نامهمان‌نوازی

**in-house** *adjective, adverb*
1 لە نێوەوەی کۆمپانی یان ڕێکخراوەیێ: *an in-house magazine* 2 لە نێوەوە، لە ژوورەوە ◯ 1 در داخل شرکت یا سازمانی 2 در داخل

**inhuman** /ɪnˈhjuːmən/ *adjective*
دڕندانە، نامرۆڤانە، دڵڕەقانە، بێ‌بەزەیی‌یانە ◯ ناانسانی، بی‌رحم

**inhumane** /ˌɪnhjuːˈmeɪn/ *adjective*
دڕندە، بێ‌سۆز، بێ‌بەزەیی، دڵڕەقانە، بێ‌بەزەیی‌یانە، دڕندانە: *inhumane treatment of animals/prisoners* ◯ وحشی، بی‌رحمانە

**inhumanely** /ˌɪnhjuːˈmeɪnlɪ/ *adverb*
بێ‌بەزەیی‌یانە، دڵڕەقانە ◯ بی‌رحمانە

**inhumanity** /ˌɪnhjuːˈmænətɪ/ *noun, pl.* inhumanities
1 دڕندەیی، هۆڤیگەری، نامرۆڤایەتی، زوڵم‌وزۆری، ستەم 2 هەڵس‌وکەوتی نامرۆڤانە، جووڵانەوەی دڕندانە: *the inhumanity of the system* ◯ 1 وحشی‌گری، ظلم 2 رفتار وحشیانە

**inhumanly** *adverb*
دڕندانە، نامرۆڤانە ◯ وحشیانە، غیرانسانی

**inhumation** /ˌɪnhjuːˈmeɪʃn/ *noun*
1 ناشتن، بنگڵ‌کردن، فەشارتن 2 تەرمی نێژراو ◯ 1 دفن 2 جسد دفن‌شدە

**inimical** /ɪˈnɪmɪkl/ *adjective*
دژ، بەرهەڵست، دوژمنانە، دوژمن‌کارانە، نادۆستانە، بەوەی، زیاناوی، تێکدەر، خراپ: *an inimical stare* ◯ مخالف، مغایر، خصمانە، مضر

**inimically** /ɪˈnɪmɪklɪ/ *adverb*
بە شێوەیەکی زیاناوی، تێکدەرانە، دوژمنکارانە، دوژمنانە ◯ بە طور مضر، بە طور خصومت‌آمیز

**inimitability** /ɪˌnɪmɪtəˈbɪlətɪ/ *noun,* also inimitableness
بێ‌هاوتایی، بێ‌وێنەیی، لەلاسایی‌نەهاتوویی ◯ بی‌مانندی، تقلیدناپذیری

**inimitable** /ɪˈnɪmɪtəbl/ *adjective*
بێ‌هاوتا، بێ‌وێنە، تایبەتی، لەلاسایی‌نەهاتوو، لاسایی ناکرێتەوە، matchless: *her own inimitable style* ◯ بی‌مانند، تقلیدناپذیر

**inimitably** /ɪˈnɪmɪtəblɪ/ *adverb*
بێ‌هاوتایانە، بە شێوەیەکی لەلاسایی‌نەهاتوو ◯ بە طور تقلیدناپذیر

**iniquitous** /ɪˈnɪkwɪtəs/ *adjective*
زۆردار، زاڵم، خراپ، نادادپەروەر، ستەم‌کار، نابەرحەق، نادادپەروەرانە، زۆردارانە، زاڵمانە، ناحەقانە ◯ ظالم، ظالمانە، غیرعادلانە

**iniquitously** /ɪˈnɪkwɪtəslɪ/ *adverb*
زۆردارانە، نادادپەروەرانە، نابەرحەقانە، زاڵمانە ◯ ظالمانە

**iniquity** /ɪˈnɪkwətɪ/ *noun, pl.* iniquities
خراپی، زۆرداری، نادادپەروەری، نابەرحەقی، زوڵم‌وزۆری، ستەم، ناحەقی: *the iniquity of racial prejudice* ◯ شرارت، ظلم، بی‌عدالتی

**initial** /ɪˈnɪʃl/ *adjective, noun*
*adj* یەکەمین، هەوەڵین، دەسپێک، سەرەتایی: *My initial reaction was to decline the offer* *n* پیتی یەکەمی ناوی کەسێ یان وشەیێ ◯ *adj* نخستین، آغازی، مقدماتی *n* حرف اول اسم شخص یا کلمه‌ای

**initially** /ɪ'nɪʃəli/ *adverb*
لە سەرەتادا: *Initially, the system worked well* ◊ در آغاز

**initiate** /ɪ'nɪʃiət/ *noun*
کەسێکی یان مرۆی تازەهاتوو ◊ آدم تازەوارد

**initiation** /ɪˌnɪʃi'eɪʃn/ *noun*
1 دەسپێک، سەرەتا، دەس پێکردن 2 چوونەنێو، وەرگرتن: *3 an initiation ceremony* خەتەنەکار، جێبەجێکردن 4 ناسیاوکردن، ناساندن، ئاشناکردن، پێ کردنەوە ◊ 1 آغاز، شروع 2 پذیرش 3 اجرا 4 آشناسازی

**initiative** /ɪ'nɪʃətɪv/ *noun*
1 دەس پێشخەری، پێش دەستی، داهێنان، توانایی داهێنان: *a United Nations peace initiative* 2 هەنگاوی هەوەڵ یان یەکەم، سەرەتایی، بەرایی ◊ 1 پیش قدمی، ابتکار، قوەی ابتکار 2 گام نخست، ابتدایی

**initiator** /ɪ'nɪʃieɪtə(r)/ *noun*
دەس پێکەر، داهێنەر: *the initiator of the project* ◊ آغازگر، مبتکر

**initiatory** /ɪ'nɪʃɪətɔːrɪ/ *adjective*
یەکەمین، سەرەتایی، بەرایی، هەوەڵین: *-tiatory proceedings* ◊ نخستین، اولین، آغازین

**initio** *adverb*
(لاتین) لە سەرەتادا (بە کورتی init دەنووسرێ) ◊ در آغاز

**injection** /ɪn'dʒekʃn/ *noun*
1 تێکردن، تێخستن، تێرژاندن، تێرشتن، لێدان، کردنەنێو، دەرزی لێدان، دەرزی وەشاندن، دەرزی، شرینقە: *He was treated with penicillin injections* 2 کورتەی = *fuel injection* ◊ تزریق، ریختن، آمپول

**injector** *noun*
دەرزی وەشێن، دەرزی لێدەر ◊ تزریق کنندە

**in-joke** *noun*
گاڵتەی نێوخۆ (پێ، دەستەیێکی تایبەتی تێیدەگا) ◊ لطیفەی درون گروهی

**injudicious** /ˌɪndʒu'dɪʃəs/ *adjective*
ناژیرانە، نابەجێ، نەشیاو، بێجێ، نالەبار، نائاقڵانە، هەڵەشە، گەوج، سەرچڵ ◊ نامعقول، بی احتیاط، احمق

**injudiciously** /ˌɪndʒu'dɪʃəsli/ *adverb*
ناژیرانە، بە شێوەیەکی بێجێ ◊ بە طور نامعقول

**injudiciousness** /ˌɪndʒu'dɪʃəsnəs/ *noun*
بێ ئەقڵی، هەڵەشەیی، سەرچڵی، گەوجێتی، بێجێ بوون، لێک نەدانەوە ◊ بی عقلی، بی احتیاطی، نسنجیدگی

**injunction** /ɪn'dʒʌŋkʃn/ *noun*
1 فەرمان، فەروار 2 گێرانەوە، بەربەندی 3 (ماف) دەستوور (نەگرانی کاری): *to seek/obtain an injunction* ◊ 1 دستور 2 نهی 3 حکم

**injured** /'ɪndʒəd, US -dʒərd/ *adjective*
1 برین دار، زامار، زام دار، برینداوی، کوڵەوار، کوفان دار، زەربەدیتوو، لێکەوتوو، ئێش پێگەیشتوو، زیان لێکەوتوو، زیان بار، زیان پێگەیشتوو 2 رەنجاو، زیز ◊ 1 مجروح، مصدوم، آسیب دیدە 2 آزردەخاطر

**injured party** *noun*
(ماف) لایەنی خراپەلەگەڵ کراو یان زیان لێکەوتوو یان زیانبار ◊ طرف زیان دیدە

**injurious** /ɪn'dʒʊəriəs, US -'dʒʊr-/ *adjective*
1 موزیر، بەوەی، زیان لێدەر، وەزەناوی، زەربەلێدەر، گورزوەشێن، بەزیان، مەترسی دار، *2 injurious effects* :damaging 2 سووکانە، ساردوسووک، لەدڵ گران هاتوو، بێ ڕێزانە ◊ 1 مضر، خطرناک، آسیب رسان 2 توهین آمیز

**injuriously** /ɪn'dʒʊəriəsli, US -'dʒʊr-/ *adverb*
بە شێوەیەکی زیاناوی ◊ بە طور آسیب رسان

**injuriousness** /ɪn'dʒʊəriəsnəs, US -'dʒʊr-/ *noun*
گورز، بەڵا، زیان، زەرەر ◊ صدمە، لطمە، آسیب

**injury** /'ɪndʒəri/ *noun, pl.* injuries
1 گورز، بەڵا، زیان، زەرەر، ئێش: *serious injuries* ◊ *injury/injuries 2 minor* سووکایەتی، بێ حورمەتی، بێ ڕێزی 3 برین، زام 4 نەنگ، ئابڕووچوون، لکە ◊ 1 صدمە، آسیب 2 توهین 3 زخم 4 ضایعە

**injury time** *noun*
(وەرزش) کاتی بەفیڕۆچوو ◊ وقت ضایع شدە

**injustice** /ɪn'dʒʌstɪs/ *noun*
1 بێ دادی، نادادپەروەری، زوڵم، ناحەقی، ستەم، ناڕەوایی، زوڵموزۆری: *fighting against poverty and injustice* ◊ *2 social injustice* کار یان کردەوەی نادادپەروەرانە ◊ 1 بی عدالتی، ظلم 2 اقدام ناعادلانە

**ink** /ɪŋk/ *noun*
جەوهەر: *a pen and ink drawing* ◊ *written in ink* ◊ مرکب

**ink-blot test** = Rorschach test

**ink-bottle** /'ɪŋk bɒtl/ *noun*
شووشەجەوهەر ◊ شیشەی مرکب

**ink-eraser** /'ɪŋk ɪreɪzər()/ *noun*
جەوهەرسڕ ◊ مرکب پاک کن

**inkhorn** /'ɪŋk hɔːn/ *noun*
(مێژوویی) جەوهەردانی شاخی ◊ دوات شاخی

**inkjet printer** /'ɪŋkdʒet prɪntə(r)/ *noun*
چاپ گەری جەوهەری ◊ چاپگر مرکبی

**inkling** /'ɪŋklɪŋ/ *noun*
1 بەگوێ دادان، ئامازە، سووکە زانیاری، سووکە

ناديـــار، شـــاراوە، نائاشـــكرا، ئالـــۆز، تـــەماوی، لەتێگەیشتن‌نەهاتوو *n* شتی هەست‌پێ‌نەکراو یان نەبینراو ۞ *adj* 1 نامحسوس، نامرئی 2 معنـوی 3 ناهویدا، بغرنج *n* چیز نامحسوس

**intangibly** /ɪn'tændʒəbli/ *adverb*
هەست‌پێنەکراوانە ۞ بە طور نامحسوس

**intarsia** /ɪn'tɑːsɪə/ *noun*
1 شێوازێکی چنین 2 دارهەڵکۆڵی ئیتالیایی لە سەدەی 15دا ۞ انتارسیا

**integer** /'ɪntɪdʒə(r)/ *noun*
1 ژمارەی تەواو، ژمارەی دروست (وەکوو 3، 4 و...، نە 3.5) 2 شتێکی تەواو ۞ 1 عدد صحیح 2 چیز درست

**integral** /'ɪntɪgrəl, US ɪn'teg-/ *adjective, noun*
*an integral part* : *adj* 1 پێکهێنەر، دامەزرێنەر 2 پێویست، تەواوکەر، *of the curriculum* تەواو، رەبەق 3 دروست، ناکەرت 4 (بیرکاری) ئینتێگراڵ *n* 1 ژمارەی دروست 2 شتی تەواو ۞ *adj* 1 تشکیل‌دهنده 2 لازم، مکمل، کامل 3 صحیح 4 انتگرال *n* 1 عدد صحیح 2 چیز کامل

**integral calculus** *noun*
(ماتماتیک) حسابی ئینتێگراڵ ۞ حساب انتگرال

**integrality** /,ɪntɪ'grælɪtɪ/ *noun*
1 تـەواویتی 2 دروسـتێتی، ناکـەرتێتی ۞ 1 تمامیت 2 انتگرالیتی

**integrally** /'ɪntɪgrəli, US ɪn'teg-/ *adverb*
بە تەواوی ۞ بە تمامی

**integrant** /'ɪntəgrənt/ *adjective, noun*
*adj* تەواوکەر *n* بەشی تەواوکەر ۞ *adj* مکمل *n* جز مکمل

**integrated** /'ɪntɪgreɪtɪd/ *adjective*
1 رێـکوپێـک، پێکـەوەکارکردوو، رێـکخـراو، یەکگرتوو، یەکپارچە : *an -ted programme* *an -tegrated transport* ◊ *of patient care* *system* 2 تێکـەڵ، گـشتی، بـێ‌دانـانی جیـاوازی (خوێندن، رەگەزی، دینی و هتد) 3 کۆوەبوو ۞ 1 منسجم، نظام‌یافته 2 مختلط 3 مجتمع

**integrated circuit** *noun*
(فیزیک) خولگەی کۆوەبوو ۞ مدار مجتمع

**integrated services digital network** *noun, abbreviation, ISDN*
نای‌ئێس‌دی‌ئێن، ئیـدێن (تۆرێکی راگەیاندن کە لەودا دەنگ، وێنە و دەیتا دەتوانن وەکوو پەیام و سیگناڵی دیجیتالیزە رابگوێزرێن) ۞ ایـدن

**integration** /,ɪntɪ'greɪʃn/ *noun*
1 یەکخـستن، تێـکهەڵکێـشان، لێکـدان، تێکـەڵکـردن، تـەواوکردن، یـەکگـرتن، یەکگرتوویی، یەکپارچەیی، پێکەوەکارکردن، گونجـان 2 (بیرکـاری) دۆزینـەوەی ئینتێگـراڵ 3 (دەروونناسی) یەکپارچەیی یان یەکگرتوویی

۞ تفوق‌ناپذیر، برطرف‌نشدنی

**insurmountably** /,ɪnsə'maʊntəbli, US -sər'm-/ *adverb*
بـــە شـــێوەیەکی بەسەرداســـەرنەکەوتوو، چارەسەرنەکراوانە ۞ بە طور برطرف‌نشدنی

**insurrection** /,ɪnsə'rekʃn/ *noun*
سەرهەڵـدان، راپـەڕین، رابـوون، ۞ rebellion شورش، قیام

**insurrectional** /,ɪnsə'rekʃənl/ *adjective*
سەرهەڵداو، راپەڕیو ۞ شورشی

**insurrectionary** /,ɪnsə'rekʃənəri, US -neri/ *adjective*
سەرهەڵداو، راپەڕیو ۞ شورشی

**insurrectionist** *noun*
سەرهەڵداو، راپەڕیو ۞ شورشی

**insuscepitibility** /,ɪnsəseptə'bɪlɪtɪ/ *noun*
کارتێ‌نەکراوی ۞ تأثیرناپذیری

**insuscepitible** /,ɪnsə'septəbl/ *adjective*
کارتێ‌نەکراو، کاری تێ‌ناکرێ ۞ تأثیرناپذیر

**int** *abbreviation* 1 interior 2 internal 3 international

**intact** /ɪn'tækt/ *adjective*
دەس‌لێنەدراو، تێکنەچوو، سەربەمۆر، دەق‌نەشکاو، هەڵـنەپچڕاو، خـراپ‌نـەبوو، زیـان لێنەکـەوتوو، تـەواو، بـێ‌خـەوش، بێ‌عـەیب، سـاغ، پـارێزراو، ۞ undamaged دست‌نخورده، بی‌عیب، سالم

**intactness** /ɪn'tæktnəs/ *noun*
دەس‌لێنەدراوی، هەڵنەپچڕاویی، خـراپ‌نـەبوویی، زیـان لێنەکـەوتوویی، پـارێزراوی، تـەواوی، بێ‌خەوشی ۞ دست‌نخوردگی، بی‌عیبی

**intagliated** /ɪn'talɪeɪtɪd/ *adjective*
(کۆن) هەڵکەنراو، هەڵکۆڵراو ۞ کنده‌کاری‌شده

**intaglio** /ɪn'talɪəʊ, US -'tɑːl-/ *noun, pl.* intaglios
1 هەڵـــکەندن 2 نەخـــشی هەڵـــکەنراو ۞ 1 کنده‌کاری 2 نقش کنده‌کاری‌شده

**intake** /'ɪnteɪk/ *noun*
1 دەروو، دەرگـا، ژمـارە یـان بـڕی هـاتوو (لـە وەختێکـی دیـاریکـراودا) 2 تەنگـەوەبوویی، تەنگایی، باریکایی، باریکەوەبوویی، وێکهاتوویی 3 مـژین، چەکانـدن 4 وەرگـرتن 5 (زانکـۆ، خوێنـدنگا، پیـشە و هتـد) وەرگـیراوان 6 (لـە ئینگلتـەرە) زەمـینی ئـاوەدان‌کراو 7 (تکنیکـی) هێزی بەکارهێنراو یان لەکارکراو ۞ 1 ورودی، مدخل 2 تنگ‌شدگی 3 مکش 4 پذیرش 5 اینتیک 6 نیروی مصرفی

**intangibility** /ɪn,tændʒə'bɪlətɪ/ *noun*
هەست‌پێنەکراوی ۞ نامحسوس بودن

**intangible** /ɪn'tændʒəbl/ *adjective, noun*
*adj* 1 هەست‌پێنەکراو، دەس‌لێنەدراو، بەردەست ناکـەوێ، نـەبینراو، نـەرم 2 نامـادی، نابابـەتی 3

کەسایەتی ◌ 1 تلفیق، ادغام، ترکیب، ادغام، اتحاد. یکپارچگی، هماهنگی 2 انتگرال گیری 3 انسجام شخصیت

**integrative** /ˈɪntɪɡrətɪv/ *adjective*
لێکدەرانە ◌ تلفیقی

**integrity** /ɪnˈteɡrəti/ *noun*
1 دروستی، راستی، سەرراستی 2 تەواویتی، دابەش‌نەبوویی، یەک‌پارچەیی، شێوەی تەواو ◌ 1 صداقت 2 تمامیت، صورت کامل

**integument** /ɪnˈteɡjʊm(ə)nt/ *noun*
پێست، قاوغ، پۆشە، توێکڵ، کەلوو، کەوڵ، چەرم، لەپکە، بەرگ، توێی داپۆشەری زیندەوەر (وەک skin، membrane و cuticle) ◌ پوست، جلد

**integumental** *adjective*
سەربە integment ◌ وابستە بە integment

**integumentary** /ɪnˌteɡjəˈmentəri/ *adjective*
سەربە integment ◌ وابستە بە integment

**intellect** /ˈɪntəlekt/ *noun*
1 هێزی تێگەیشتن، ئەقڵ، عەقڵ، توانایی بەلگەهێنانەوە و تێگەیشتن بە شێوەیێکی بابەتی، ئاوەز، هۆش، تێگەیشتن، بیرمەند، بەئاوەز، تێگەیشتوو، زیر، ئاقڵ، ئەقڵ‌مەند 2 ئاقلان، زیران ◌ 1 خرد، متفکر، خردمند 2 خردمندان

**intellection** /ˌɪntəˈlekʃn/ *noun*
ئەقلانیەت، تێگەیشتن، هزر، بیر، بیرکردنەوە، تێڕامان، thought ◌ تعقل، فهم، اندیشە، تفکر

**intellective** /ˌɪntəˈlektɪv/ *adjective*
ئەقلی، عەقلی، ئاوەزمەندانە، هزری، بیری، فکری ◌ عقلی، فکری

**intellectual** /ˌɪntəˈlektʃuəl/ *adjective, noun*
*adj* 1 ئەقلانی، عەقلانی، ئاوەزمەندانە، ئەقلی، عەقلی، فکری، هزری، بیری، هۆشی، زەینی، مێنتاڵ 2 ئاقلانە، زیرانە: *an intellectual novel* 3 زیر، ئەقڵ‌مەند، *intellectual curiosity* ◊ ئاقڵ، عاقڵ، تێگەیشتوو، رۆشنبیر، رووناکبیر، بیریار، هزرڤان: *n She's very intellectual* مرۆی رۆشنبیر یان بیرمەند ◌ *adj* 1 عقلانی، فکری، عقلی، ذهنی 2 خردمندانە 3 خردمند، روشنفکر، اندیشمند *n* آدم روشنفکر یا اندیشمند

**intellectual ability** *noun*
توانایی تێگەیشتوویی ◌ توانایی هوش‌مندی

**intellectual concept** *noun*
چەمکی هزری یان فکری ◌ مفهوم فکری

**intellectual conflict** *noun*
ململانێی هزری ◌ کشاکش فکری

**intellectual control** *noun*
کۆنترۆڵی هزری ◌ مهار فکری

**intellectual development** *noun*
پەرەسەندنی ئەقلی، گەشەی ئەقلانی (یان عەقلانی) ◌ رشد عقلی

**intellectual force** *noun*
هێزی بیری یان هزری ◌ نیروی فکری

**intellectual freedom** *noun*
ئازادی هزری، سەربەستی بیری ◌ آزادی فکری

**intellectual history** *noun*
مێژووی هزری یان بیری ◌ تاریخ فکری

**intellectualism** /ˌɪntəˈlektʃuəlɪzəm/ *noun*
1 ئینتیلێکتوالیزم 2 (فەلسەفە) = rationalism ◌ عقل‌گرایی

**intellectualist** /ˌɪntəˈlektʃuəlɪst/ *noun*
ئینتیلێکتوالیست ◌ عقل‌گرا

**intellectualistic** *adjective*
ئینتیلێکتوالیستی ◌ عقل‌گرایانە

**intellectualization** *noun*
ئەقلانی‌کردن، عەقلانی‌کردن، لە رووی ئەقلەوە جوولانەوە ◌ عقلانی‌سازی

**intellectually** *adverb*
لەباری ئەقلانی (یان عەقلانی‌یەوە)، لەباری هزری(یەوە): *intellectually challenging* ◌ از نظر عقلانی، از لحاظ فکری

**intellectual perception** *noun*
تێگەیشتنی ئەقلانی ◌ ادراک عقلی

**intellectual property** *noun*
خاوەنداریتی یا مافی مەعنەوی، مافی خاوەن‌بەرهەم ◌ مالکیت معنوی

**intellectual symbol** *noun*
هێمای هزری یان بیری ◌ نماد فکری

**intellectual system** *noun*
دەزگای بیری یان هزری ◌ دستگاه فکری

**intellectual transition** *noun*
تێپەڕینی هزری یان بیری، تێپەڕینی فکری ◌ گذار فکری

**intellectual world** *noun*
جیهانی هزری یان بیری، دنیای هزری ◌ جهان فکری

**intelligence** /ɪnˈtelɪdʒəns/ *noun*
1 هۆش، زەین، توانایی تێگەیشتن، توانایی هۆشی یان مێنتاڵ، تێگەیشتن، زیرەکی، ئەقڵ، زیری، ئاوەز 2 هەواڵ، نووچە 3 ئاگاداری، ئاگایی، زانیاری، هەواڵ‌گری، بەڕێوەبەرایەتی هەواڵ‌گری، دەزگای سیخوڕی 4 (کۆن) دەنگ‌وباس، هەواڵەکان، نووچە ◌ 1 هوش، فراست، ادراک، عقل 2 خبر 3 آگاهی، اطلاعات، ادارەی اطلاعات 4 اخبار

**intelligence creative** *noun*
هۆش یان زەینی داهێنەر ◌ ذهن خلاق

**intelligence quotient** *noun*
ئای کیو، رادەی هۆشی، ئاستی زیرەکی، رادەی زیرەکی (کورتەکەی IQ) ◌ بهرەی هوشی

**intelligencer** *noun*
(کۆن) سیخوڕ، هەواڵ‌بەر، ئاگایی‌پێدەر ◌

جاسوس

**intelligence test** *noun*

تاقی‌کاری هۆش یان زیرەکی ۞ آزمون هوش

**intelligent** /ɪn'telɪdʒənt/ *adjective*

لەسەرهۆش، بەهۆش، زەین‌ڕوون، تێگەیشتوو، زیر، بەئاوەز، ئاقڵ، زیرەک، زرنگ، وریا، زیرەکانە، بەهۆشانە: *a highly intelligent* ۞ *intelligent software/systems* ◊ *child* باهوش، عاقل، هوشمندانه

**intelligential** /ɪnˌtelɪ'dʒənʃl/ *adjective*

ئەقڵانی، ئاوەزمەندانە، تێگەیشتوو، بەهۆش، زیرەک ۞ عقلانی، بافراست

**intelligently** /ɪn'telɪdʒəntli/ *adverb*

ژیرانە، ئاقڵانە، زیرەکانە، تێگەیشتووانە ۞ عاقلانه، هوشمندانه

**intelligentsia** /ɪnˌtelɪ'dʒentsiə/ *noun*

ڕۆشنبیران، ڕووناکبیران (ب.ت. لە بواری هونەر، ویژە و سیاسەتدا) ۞ روشنفکران

**intelligent system** *noun*

دەزگای تێگەیشتوو یان بەهۆش ۞ سیستم هوشمند

**intelligibility** /ɪnˌtelɪdʒə'bɪləti/ *noun*

ئاسانی، لەتێگەیشتن‌هاتوویی، ڕوونی ۞ فهم‌پذیری

**intelligible** /ɪn'telɪdʒəbl/ *adjective*

ئاسان، سادە، لەتێگەیشتن‌هاتوو، لە تێگەیشتن دێ، ڕوون، ڕۆشن، دیار، (فەلسەفە) تەنیا بە ئەقڵ لە تێگەیشتن دێ: *His lecture was readily* ◊ *intelligible to all the students* *The* ۞ *child's speech was barely intelligible* قابل فهم، فهم‌پذیر، قابل درک

**intelligibly** /ɪn'telɪdʒəbli/ *adverb*

بە شێوەیەکی ئاسان یان لەتێگەیشتن‌هاتوو ۞ به طور قابل فهم

**Intelsat** /'ɪntelsæt/ *noun*

ئینتێلسات (= ڕێکخراوەی وڵاتانی سیستمی سانەلایتی نێونەتەوەیی) ۞ انتل‌سات

**intemperance** /-pərəns/ *noun*

1 زێدەڕەوی، خۆبێ‌ڕانەگیراوی، پارێزنەکردن، نائەندازەڕەوی 2 توندی ۞ 1 عدم اعتدال 2 شدت

**intemperate** /ɪn'tempərət/ *adjective*

1 زێدەگافی، زێدەڕەو، زێدەڕەو، خۆبێ‌ڕانەگیراو، پارێزنەکردوو، بێ‌پارێز، نەپرێنگاو، پێش‌نەگیراو، بێ‌جڵەو، بەری ناگیرێ، بێ‌کۆنترۆڵ 2 توند، توندوتیژ (intemperateness *n*) ۞ 1 افراطی، خارج از کنترل 2 شدید

**intemperately** /ɪn'tempərətli/ *adverb*

زێدەڕەوانە ۞ به طور افراطی

**intendance** /ɪn'tendəns/ *noun*

بەڕێوەبردن، ڕێڤەبرن، گێران، سەرپەرشتی، چاودێری، زیرەڤانی، management ، superintendence ۞ مدیریت، مباشرت، نظارت

**intendant** /ɪn'tendənt/ *noun*

1 بەڕێوەبەر، سەرپەرشت، چاودێر، زیرەڤان 2 (مێژوویی) سەرناوی کاربەدەستێکی پایەبەرز، ب.ت. لە سپانیا، فەرەنسە و پۆرتوگال ۞ 1 مدیر، مباشر، ناظر 2 انتندانت

**intended** /ɪn'tendɪd/ *adjective, noun*

1 *adj* لەبەرچاوگیراو، پێوەبوو، تایبەتی 2 بەردڵ، باش، دڵخواز، مەبەست، خیاڵبوو *n* دەزگیران، ژنی داهاتوو ۞ 1 *adj* موردنظر، در نظرگرفته‌شده، خاص 2 مطلوب، منظور *n* نامزد

**intendment** *noun*

واتا، مانا، چەمک، مەبەست ۞ معنی، مفهوم، مقصود

**intense** /ɪn'tens/ *adjective*

1 زۆر، بەحوجەت، سەخت، توند، گران، بەهێز، قووڵ، خەست، قورس، ئەستوور (وەکوو ڕق) یەکجار، توند، سەخت، بەرشت، تیژ 2 بەتین، بەسۆز، گەرموگوڕ 3 توند، تۆخ 4 تیژ، درەوشاوە، زەق ۞ 1 شدید، حاد، عمیق، قوی، حاد، جدی 2 پرحرارت 3 سیر 4 درخشان

**intensely** /ɪn'tensli/ *adverb*

بە توندی، بەڕشتانە: *She disliked him intensely* ۞ به شدت، به طور جدی

**intenseness** /ɪn'tensli/ *noun*

زۆری، توندی، سەختی، خەستی، قورسی ۞ شدت، سختی

**intensification** /ɪnˌtensɪfɪ'keɪʃn/ *noun*

1 خەستکردنەوە، توندکردن، سەختاندن، حوجەت‌پێدان، تیژکردن، زۆرکردن، زیادکردن، بەهێزکردن 2 (وێنەگری) زیادکردنی تەڵخی یان ماتی نێگاتیڤێ بە مادەیێکی کیمیایی ۞ 1 تشدید 2 تقویت

**intensifier** /ɪn'tensɪfaɪə(r)/ *noun*

1 (ڕێزمان، ئاوەڵناو و ئاوەڵکار) بەهێزکەر، زیادکەر، جەختی 2 (وێنەگری) ماک یان مادەیێکی کیمیایی کە بۆ ماتاندن یان تەڵخاندنی نێگاتیڤێ بەکاردێتری ۞ 1 قید تأکیدی 2 اینتنسیفیر

**intension** /ɪn'tenʃn/ *noun*

زۆری، توندی، سەختی، حوجەت، خەستی، قووڵی، بەهێزی، بەڕشتی، سووربوون ۞ شدت، جدیت، قوت

**intensity** /ɪn'tensəti/ *noun, pl.* intensities

1 زۆری، توندی، سەختی، تیژی، حوجەت، بەهێزی، بەقەوەتی، قووڵی، گرانی، خەستی، بەڕشتی، سووربوون، سۆز، وروژان، کڵ‌وکۆ: *2 intensity of feeling/concentration/relief* (ڕەنگ) تۆخی، توندی ۞ 1 شدت، عمق، جدیت، شور 2 سیری

**intensive** /ɪn'tensɪv/ *adjective, noun*

1 *adj* خەست، خەست‌وخۆڵ، لەسەریەک،

قــورس، تونــد، چــر، تیــژ، ســهخت، چرویــر، تیروتهســهل 2 (ڕێزمـان، ئاوەڵـناو و ئاوەڵـکار)

**intensifier** - *n* بەهێزکـەر، زیادکـەر، جـەختی ◌ 1 عمیق، متمرکز، فشرده 2 تأکیدی

**intensive care** *noun*

(بەشـێ لـە نـەخۆشخانـە) چـاودێری تایبـەت، ئاگاداری خەسـت(وخۆل)، ئاگالێبوونی تایبـەت (یان بەردەوام) ◌ مراقبت‌های ویژه

**intensively** /ɪn'tensɪvli/ *adverb*

بە توندی: *This case has been intensively studied* ◌ به شدت

**intensiveness** /ɪn'tensɪvnəs/ *noun*

توندی، خەستی، لەسـەریەکی، خەسـتوخۆلی ◌ شدت، فشردگی

**intent** /ɪn'tent/ *adjective, noun*

*adj* 1 بەپەرۆش، تامەزرۆ 2 (بە)ڕشت، شێلگیر، مجد، سوور، بەبڕیار 3 سەرنجپێداو، چڕەوەبوو 4 (یەکجار) سەرگەرم، سەرقاڵ، پڕکار، خەریک، دەسنەپـەرژاو، دەسگـیراو *n* 1 نیـاز، خـەیاڵ، مەبەست، ئامانج 2 بڕیار 3 واتا، مانا، چەمک 4 نێوەرۆک، ناوآخن ◌ *adj* 1 مـشتاق 2 جـدی، مصمم 3 متوجه 4 مـشغول *n* 1 قـصد، منظـور 2 تصمیم 3 معنی، مفهوم 4 مفاد

**intention** /ɪn'tenʃn/ *noun*

1 نیـاز، تیهـات، خـەیاڵ، مەبەسـت، خـەیاڵ، خواست، ئامانج: *I have no intention of going to the wedding* 2 بڕیار 3 واتا، واتە، مانا، چەمک، نێوەرۆک ◌ 1 قـصد، منظـور 2 تصمیم 3 معنی، مفهوم

**intentional** /ɪn'tenʃənl/ *adjective*

ئانقەسـت، بەمەبەسـت، پێوەبـوو، deliberate، intended: *I'm sorry I left you off the list—it wasn't intentional* ◌ عمدی

**intentionally** /-ʃənəli/ *adverb*

بـە ئانقەسـت، بەمەبەسـتانە، دانـسـتە، پێوەبووانـە: *I ◊ She would never -enally hurt anyone kept my statement -ionally vague* ◌ عمداً

**intently** /ɪn'tentli/ *adverb*

1 بەپەرۆشـانە، تامەزرۆیانـە 2 بـە بڕیارەوە، لـە ڕووی بڕیارەوە: *I listened intently to what she had to say* ◌ 1 مشتاقانه 2 با تصمیم

**intentness** /ɪn'tentnəs/ *noun*

1 بەرشتبوون، سووربوون، تێکۆشان 2 بەگوڕی بەتینی، جۆش، گوڕ 3 خەستی 4 سـەرنجپێدان ◌ 1 جدیت 2 شور 3 عمق 4 توجه

**inter** = intermediate

**inter-** /'ɪntə(r)/ *prefix*

پێشگر: 1 نێوان، نێو، ناو، ناف: *interbreed* 2 لێک، پێک، پێکەوە، دوولایەنـە: *interatomic* (بنەڕەت: لە *-entre* فەرەنسی کۆنەوە یان *inter* لاتینـەوە "between, among") ◌ پیـشوند: 1 میان، بین 2 درهم، متقابل

**interaction** /ˌɪntər'ækʃn/ *noun*

1 کارلێک(کردن)، کارلێکترکردن، پەرچەکردار، کـار و کاردانـەوە، کاریگـەری یـان کـردەوەی دوولایەنە یان دووقۆڵی 2 پێوەندی ◌ 1 کـنش متقابل، برهم‌کنش، تراکنش، تعامل 2 ارتباط

**interactional** *adjective*

سەربە interaction ◌ وابسته به interaction

**interactionism** *noun*

کارلێکگەری (هـۆش و لـەش، لـە فەلسـەفەدا)، ئینتێرئەکشنیزم ◌ نظریه‌ی عمل متقابل

**interactionis** *noun, adjective*

*n* کارلێـکگـەر *adj* سـەربە کارلێـکگـەری، کارلێـکگـەری‌یانـە ◌ *n* انداکـسیونیـسـت *adj* انداکسیونیستی

**interactive** /ˌɪntər'æktɪv/ *adjective*

1 کارلێکی‌یانە، کارلێککەر، پێوەندی‌یانە، کـار و کاردانـەوەیی، پەرچـەکرداری‌یانـە 2 (کـامپیوتێر) دوولایەنـە، پێکەوەکارکـەر: *interactive systems/video* ◌ 1 تعـاملی 2 (کـامپیوتر) دادوستدی

**interactively** /ˌɪntər'æktɪvli/ *adverb*

بە شێوەیەکی کارلێکی‌یانە، کارلێککەرانە ◌ به طور تعاملی

**interagency** /ɪntər'eɪdʒənsəɪ/ *noun*

نێوبژایـەتی، نێـوگژی، ناڤـبەری، نێونجایـەتی ◌ وساطت

**interagent** /ɪntər'eɪdʒənt/ *adjective*

نێوبژیوان، نێوگژیوان، ناڤبەر، نێونجی ◌ واسطه

**inter alia** /ˌɪntər 'eɪliə/ *adverb*

(لاتین) لەنێوان شتەکانی تردا، لەپاڵ شـتەکانی تردا، وێڕای شتەکانی تر ◌ در میان چیزهای دیگر

**inter alios** /ˌɪntər 'eɪlɪəʊs, US 'alɪəʊs/ *adverb*

(لاتین) لەنێوان کەسانی تردا ◌ در میان اشخاص دیگر

**interatomic** *adjective*

نێوانگەردیلەیی، (لە) نێوان دوو گەردیلە(دا) ◌ میان دو اتم

**inter-allied** *adjective*

سەربە یان پێکهاتوو یان هاوپەیمانان دەگرێتـەوە ◌ انترآلید

**interaxial** /ˌɪntər'æksɪəl/ *adjective*

(لـە) نێـوان دوو تـەوەر، نێودووتـەوەری، نێوانتەوەری ◌ میان دو محور

**intercalary** /ɪn'tɜːkəl(ə)ri, US ˌɪntə'kal(ə)ri/ *adjective*

1 پێنـزۆ، گیـسە 2 سـەرخراو، زیـادکراو 3 (ڕووەکناسـی) نێـوانگـیر: ئامـاژە بـە شـانەی دابـەشـان meristem کـە لـە نێـوان خانـە کچی‌یەکاندا daughter cells هەڵکەوتووە ◌

1 کبیسه 2 افزوده 3 میان‌جای

**intercalary year** *noun*

ساڵی پێنژۆ، ساڵی گبیسە ◌ سال کبیسه

**intercalation** /ɪnˌtɜːkəˈleɪʃn/ *noun*

1 تێ‌ترنجاندن، تێ‌خستن، خستەنێو، نێوان‌گیری 2 خستنەسەری رۆژ یان مانگ بە ساڵی مانگی ◌ 1 درج 2 کبس

**interceder** *noun*

نێوگژیوان، ناونجی، نێوبژیکەر، ناوبژیوان، ناقبەر، تکاکار ◌ وساطت‌کننده، شافع

**intercellular** /ˌɪntəˈseljələ(r)/ *adjective*

(زیندەناسی) نێوخانەیی، نێوان‌خانەیی، هەڵکەوتوو لە نێوان خانەکان‌دا ◌ واقع در میان یاخته‌ها

**interception** /ˌɪntəˈsepʃn/ *noun*

1 راوێستاندن، راگرتن، رێ‌لێگرتن، سەررێ‌پێگرتن، جڵەوگیری، جڵەوگرتن، بەرەوبری، پێشەبڕکێ، رێ‌لێبڕین، نەهێشتن، کۆسپ‌خستنەرێ 2 دابڕین، جیاکردنەوە ◌ 1 متوقف‌سازی، جلوگیری 2 قطع

**interceptive** /ˌɪntəˈseptɪv/ *adjective*

راوەستێنەر، راگر، رێ‌لێگر، رێ‌پێگر ◌ جلوگیری‌کننده، متوقف‌ساز

**interceptor** /ˌɪntəˈseptə(r), US -tərˈs-/ *noun*

1 فڕۆکەی رێگر، فڕۆکەی شوێن‌کەوتوو 2 مرۆی رێ‌پێگر ◌ 1 هواپیمای رهگیر 2 آدم متوقف‌ساز

**intercession** /ˌɪntəˈseʃn, US -tərˈs-/ *noun*

1 تکاکاری، ناوبژیوانی، نێوگژیوانی، کویخایی، ناقبەری 2 داوا یان دۆعای بەخێر ◌ 1 شفاعت، میانجی‌گری 2 درخواست یا دعای خیر

**intercessional** /ˌɪntəˈseʃənl, US -tərˈs-/ *adjective*

تکاکارانە ◌ شفاعت‌آمیز

**intercessor** *noun*

نێوگژیوان، نێوبژیکەر، ناقبەر ◌ میانجی

**intercessorial** /ˌɪntəsɪˈsəʊrɪəl/ *adjective*, also intercessory

تکاکارانە ◌ شفاعت‌آمیز، شفاعتی

**interchange** /ˈɪntətʃeɪndʒ, US -tərtʃ-/ *noun*

1 گۆڕین، گۆڕینەوە، ئاڵوگۆڕ، ئاڵشت (ب.ت. بیر و بۆچوون) 2 پێک‌گەیشتنەوە، یەکتربڕین ◌ 1 تعویض، مبادله 2 التقاء، تقاطع

**interchangeability** /ˌɪntəˌtʃeɪndʒəˈbɪləti, US -tərˌtʃ-/ *noun*

لەگۆڕینەوەهاتوویی، لەئاڵوگۆڕهاتوویی ◌ قابلیت تعویض، مبادله‌پذیری

**interchangeable** /ˌɪntəˈtʃeɪndʒəbl, US -tərˈtʃ-/ *adjective*

لەگۆڕینەوەهاتوو، جێگۆڕکێ‌یان پێ دەکرێ، دەگۆڕدرێنەوە، لەئاڵوگۆڕهاتوو؛ هاوواتا ◌ قابل تعویض، مبادله‌پذیر؛ مترادف

**interchangeably** /ˌɪntəˈtʃeɪndʒəbli, US -tərˈtʃ-/ *adverb*

هاوواتایانە، بە یەک واتا؛ لەگۆڕینەوەهاتووانە: ◌ *These terms are used interchangeably* به طور مترادف؛ به طور قابل تعویض

**intercity** /ˌɪntəˈsɪti, US -tərˈs-/ *adjective, noun*

نێوان شاری، نێوشاری: *an intercity rail service* ◌ بین شهری

**intercollegiate** /ˌɪntəkəˈliːdʒiət, US ˌɪntərkə-/ *adjective*

نێو(ان)کۆلێژی: ◌ *intercollegiate football* بین دانشکده‌ای

**intercolonial** /ˌɪntəkəˈləʊnɪəl/ *adjective*

نێو(ان)داگیرگەیی، نێو(ان)کۆلۆنیاڵ ◌ بین‌مستعمره‌ای

**intercolumniation** /ˌɪntəkəlʌmnɪˈeɪʃ(ə)n/ *noun*

(بیناسازی) نێو(ان)کۆڵەکەبەندی، ڕێکخستنی مەودای نێوان ستوون یان کۆڵەکەکان ◌ انترکالیومیناسیون

**intercolumnar** /ˌɪntəkəˈlʌmnɪə(r)/ *adjective*

نێو(ان)دووستوونی، نێوان دووکۆڵەیی، هەڵکەوتوو لە نێوان دوو ستوون ◌ واقع در میان دو ستون

**intercom** /ˈɪntəkɒm, US ˈɪntərkɑːm/ *noun*

ئینتێرکام (کورتەی intercommunication system) ◌ انترکام

**intercommunication** /ˌɪntəkəˌmjuːnɪˈkeɪʃn, US -tərkə-/ *noun*

پێوەندی دوولایەنە، پێکەوە قسە کردن، هاوپێوەندی، پەیام گۆڕینەوە ◌ ارتباط متقابل

**intercommunication system** *noun*

ئینتێرکام (سیستمێکی پێوەندی‌یە کە خەڵک دەتوانن لە بەشە جیاجیاکانی خانووبەرە یان فڕۆکەیێ پێکەوە قسە بکەن) ◌ انترکام

**intercommunion** /ˌɪntəkəˈmjuːnɪjən/ *noun*

پێوەندی دوولایەنە (لە نێوان کلێسە جیاوازەکان، ب.ت. کاتۆلیک و ئۆرتۆدۆکس) ◌ ارتباط متقابل

**interconnected** *adjective*

پێکەوەبەستراو، پێکەوەبەند، ناسەربەخۆ، هاوپێوەند ◌ مرتبط

**interconnecting** *adjective*

پێوەندی‌دەر، پێکەوەی دەبەستێتەوە، پێکەوەبەست، پێکەوەبەستەر، لێک‌گرێدەر، پێکبەست(ەر)، پێکەوەبەستراو، پێکەوەبەند ◌

ارتباطی، رابط، مربوط به هم

**interconnection** /ˌɪntəkəˈnekʃn, US -tərkə-/ *noun*, also -connexion
بەستنەوە، پێکەوەبەستن، هاوبەندی، پێوەستی، پێک‌گرێدانی، پێوەندی، تێکەڵی: *interconnections between different parts of the brain* ۞ اتصال، ارتباط

**intercontinental** /ˌɪntəˌkɒntɪˈnentl, US ˌɪntərˌkɑːn-/ *adjective*
نێو(ان)وشکاری، نێوانکیشوەری، وشکاربڕ، کیشوەربڕ، نێوان وشکارەکان: *intercontinental missiles/travel/trade* ◊ *-tercontinental flights* ۞ بین‌قاره‌ای، قاره‌پیما

**intercontinental ballistic missile** *noun*
مووشەکی دوورهاوێژ، مووشەکی کیشوەربڕ ۞ موشک قاره‌پیما

**interconversion** *noun*
گۆڕانی دوولایەنە، گۆڕانی دوو شت بۆ یەکتر ۞ تبدیل متقابل

**interconvertibility** *noun*
لەگۆڕینهاتوویی ۞ قابلیت تبدیل

**interconvertible** /ˌɪntəkənˈvɜːtəbl/ *adjective*
لەگۆڕینهاتوو، شیاوی گۆڕین، دەگۆڕێ ۞ قابل تبدیل

**intercorrelation** /ˌɪntəkɒrəˈleɪʃ(ə)n/ *noun*
هاوپێوەندی، پێوەندی دووقۆڵی نێوان دوو یان چەند شت ۞ ارتباط میان دو یا چندین چیز

**intercostal** /ˌɪntəˈkɒstl/ *adjective, noun*
*adj* نێو(ان)پەراسوویی، هەڵکەوتوو لە نێوان پەراسووەکاندا *n* ماسوولکەی نێوانپەراسوویی ۞ *adj* میان‌دنده‌ای *n* ماهیچه‌ی میان‌دنده‌ای

**intercourse** /ˈɪntəkɔːs, US ˈɪntərkɔːrs/ *noun*
1 گۆڕینەوە، ئاڵوگۆڕ، ئاڵشت، سەودا 2 نزیکی، نیان، هاوجێیی، دەستێکەڵکردن، = sexual intercourse ۞ 1 مبادله، تبادل، معامله 2 جماع، آمیزش جنسی

**intercross** = hybrid

**intercrural** /ˌɪntəˈkrʊər(ə)l/ *adjective*
نێو(ان)لاقی، لە نێوان لاقەکاندا یان پێکاندا ۞ میان پاها

**intercultural** *adjective*
نێو(ان)چاندی، نێوانفەرهەنگی، نێوانکولتوری ۞ میان‌فرهنگی

**intercurrence** /ˌɪntəˈkɜːrəns/ *noun*
روودان لە نێوان کارێ ۞ حدوث در میان عملی

**intercurrent** /ˌɪntəˈkɜːrənt/ *adjective*
رووداو لە نێوان کارێ ۞ حادث در میان عملی

**interdenominational** /ˌɪntədɪˌnɒmɪˈneɪʃənl, US ˌɪntərdɪˌnɑːm-/ *adjective*
هاوبەش لە نێوان گروپە دینە یان ئایینە جیاوازەکان(دا)، نێو(ان)تیرەیی یان دەستایینی ۞ مشترک در میان فرقه‌ها

**interdepartmental** /ˌɪntəˌdiːpɑːtˈmentl, US ˌɪntərˌdiːpɑːrt-/ *adjective*
ئینتێردیپارتمێنتاڵ، نێوانبەشی، نێوان لقەکان ۞ میان‌شعبه‌ای

**interdependence** /-əns/ *noun*
پشت‌پێک‌بەستن، پێکەوەبەندبوون، پێکەوەبەندی، سەربەیەکی، پێکەوەبەستراوی، سەربەیەکی ۞ وابستگی متقابل

**interdependent** /ˌɪntədɪˈpendənt, US -tərdɪ-/ *adjective*
پێکەوەبەستراو، پێکەوەبەند، پشت‌پێک‌بەستوو، سەربەیەک: *-dependent organizations* ۞ لازم و ملزوم یکدیگر، دارای وابستگی متقابل

**interdependently** /ˌɪntədɪˈpendəntli, US -tərdɪ-/ *adverb*
پێکەوەبەستراوانە، پێکەوەبەندانە ۞ به طور لازم و ملزوم

**interdict** /ˈɪntədɪkt, US ˈɪntərd-/ *noun*
1 دەستووری نەکردن 2 فەرمان یان دەستووری بەشدارینەکردن (لە کلیسەی کاتولیکی رۆم‌دا) 3 بەربەندی، نەهێشتن، قەدەغە ۞ 1 حکم نهی 2 حکم عدم مشارکت 3 ممنوعیت، منع، قدغن

**interdiction** /ˌɪntəˈdɪkʃn, US -tərˈd-/ *noun*
1 دەستووری نەکردن 2 بەربەندی، نەهێشتن، قەدەغە: *the Customs Service's drug interdiction programs* ۞ 1 حکم نهی 2 ممنوعیت، منع

**interdictory** /ˌɪntəˈdɪktərɪ, US -tərˈd-/ *adjective*
بەربەند(ی)یانە ۞ نهی‌آمیز

**interdigital** *adjective*
نێوانپەنجەیی، نێو(ان)قامکی ۞ میان‌انگشتی

**interdisciplinary** /ˌɪntəˈdɪsəplɪnəri, US ˌɪntərˈdɪsəplɪneri/ *adjective*
ئینتێردیسیپلینێری، فرەلقی، نێوانلقی، نێولقی: *intersisciplinary research* ۞ میان‌رشته‌ای (interdisciplinarity *n*)

**interdisciplinary studies** *noun, pl.*
خوێندنەوە یان لێکۆڵینەوە نێوانلقییەکان ۞ مطالعات میان‌رشته‌ای

**interest** /ˈɪntrəst, US -trest/ *noun*
1 هۆگری، تامەزرۆیی، دڵپێوەبوون، دڵتێچوون، تاسە، دڵبەستەیی، مەیل، ویست، حەز 2 راکێشان، خۆشی، سەرنج‌راکێشان 3 بەرژەوەندی، قازانج، بەهرە، هاوە، بارەچە، مەفا، کەڵک 4 بەش، پشک 5 سوود، بەهرە 6 گرنگایەتی،

دەس ڕۆیشتوویی، بایەخ پێدان، بەهێند گرتن، بەتەنگەوەبوون 7 (کۆن) = self-interest ◌ 1 علاقه، دلبستگی، رغبت 2 جذبه 3 مصلحت، نفع 4 سهم 5 بهره، ربح، نزول 6 اهمیت، نفوذ، اهتمام

**interested** /ˈɪntrəstɪd, US -trest-/ *adjective*
1 دڵبەستە، هۆگر، تامەزرۆ 2 کە قازانجی تیایەتی 3 لاگرانە، بە غەرەزەوە، نادادپەروەرانە ◌ 1 علاقه‌مند 2 ذینفع 3 مغرضانه

**interest-free** *adjective, adverb*
(قەرز) بێ سوود، بێ بەهرە، بێ بارە: *an interest-free credit* ◊ *free loan* ◌ بدون بهره، قرض الحسنه

**interest group** *noun*
کۆمەڵی سەنگی(دانان) یان گوشار، گرووپی تەنگەتاوی ◌ گروه فشار

**interesting** /ˈɪntrəstɪŋ, US -trest-/ *adjective*
خۆش، سەرنج ڕاکێش، بالکێش: *an interesting question/point* ◌ جالب

**interestingly** /ˈɪntrəstɪŋli, US -trest-/ *adverb*
سەرنج ڕاکێشانە، بە خۆشی یەوە، بە شێوەیێکی سەرنج ڕاکێش ◌ به طور جالب توجه

**interest rate** *noun*
ڕادەی سوود، ئەندازەی سوود، ڕێژەی سوود یان بەهرە ◌ میزان بهره

**interface** /ˈɪntəfeɪs, US -tərf-/ *noun*
1 خاڵی هاوبەش، ڕووی هاوبەش، ئاستی هاوبەش، هاوڕوو، جەمسەر، خاڵی پێک گەیشتن 2 (کامپیوتێر) بەستەر (بارچەیێ لە کامپیوتێر کە دوو دەزگای جیاواز پێکەوە دەبەستێتەوە) 3 ڕووبەڕووبوونەوە ◌ 1 نقطه‌ی مشترک، سطح میانی، نقطه‌ی تلاقی 2 رابط 3 رویارویی

**interfacial** /ˌɪntəˈfeɪʃl/ *adjective*
هەڵکەوتوو لە نێوان دوو ڕوو، دووڕوویە ◌ واقع در میان دو وجه

**interfaith** /ˈɪntəfeɪθ, US -tərf-/ *adjective*
نێوان باوەڕ یان دینە جیاوازەکان ◌ میان مذاهب مختلف

**interference** /ˌɪntəˈfɪərəns, US -tərˈfɪr-/ *noun*
1 دەس تێوەردان، دەسکاری، مایی تێکردن، خۆتێوەردان، دەس تێخستن، خۆ تێکەڵ کردن، خۆ تێ هەڵقوتاندن: *political interference in legal proceedings* 2 پێکاچوون، بەیەکاچوون، چوونەنێویەک 3 ململانێ، کێشە، پێکادان 4 شێوان، تێکچوون، خشە(خش) ◌ 1 دخالت، مداخله 2 تداخل 3 تعارض 4 اختلال، پارازیت

**interferential** /ˌɪntəfəˈrenʃl, US -tərfɪˈr-/ *adjective*
پێکاچووانە، سەربە پێکاچوون یان بەیەکاچوون، سەربە یان پێوەندی بە interference ـەوە هەیە ◌ تداخلی

**interfering** /ˌɪntəˈfɪərɪŋ, US -tərˈfɪr-/ *adjective*
خۆ تێ هەڵقوتێن، خۆتێوەردەر ◌ فضول

**interferometer** /ˌɪntəfəˈrɒmɪtə/ *noun*
پێکاچوون پێو ◌ تداخل سنج

**interferometric** *adjective*
سەربە پێکاچوون پێوی ◌ وابسته به تداخل سنجی

**interferometry** *noun*
پێکاچوون پێوی ◌ تداخل سنجی

**interferon** /ˌɪntəˈfɪərɒn, US ˌɪntərˈfɪrɑːn/ *noun*
(زیندەکیمیا) ئینتێرفێرۆن: کەرستەیێ کە لەش بەرهەمی دێنێ تا لە بەرامبەر ڤایرۆس و نەخۆشی یەکاندا ڕاوێستێ؛ پرۆتینێکی کە لە لایەن خانەی گیانەوەرییەوە دەردەدرێ و ڕێ لە زۆربوونی ڤایرۆس دەگرێ ◌ انترفرون

**interferon alpha** = alpha interferon

**interferon beta** = beta interferon

**interferon gamma** = gamma interferon

**interfluent** /ˌɪntəˈfluːənt/ *adjective*
دەڕژێتە نێو یەکەوە، نێویەک ڕژاو، سەریەک چووە ◌ درهم ریزنده

**interfusion** /ˌɪntəˈfjuːʒn/ *noun*
تێکەڵ کردن، تێک وەردان، تێکەڵ یەک کردن، لێکدان ◌ درهم آمیزی

**intergalactic** /ˌɪntəgəˈlæktɪk, US -tərgə-/ *adjective*
نێو(ان)گالاکتیک، (لە) نێوان کاکێشانەکان(دا)، هەڵکەوتوو یان سەربە بۆشایی یەکانی نێوان کاکێشانەکان؛ سەربە یان لە دەرەوەی بۆشایی دا ڕوودەدا: *intergalactic battles* ◌ میان کهکشانی

**intergeneric** /ˌɪntədʒɪˈnerɪk/ *adjective*
(زیندەناسی) نێو(ان)ڕەگەزی ◌ میان جنسی

**interglacial** *adjective, noun*
*adj* لە نێوان دوو سەردەمی سەهۆڵبەنداندا *n* قۆناخ یان سەردەمی نێوان سەهۆڵبەندان ◌ *adj* میان دو دوره‌ی یخبندان *n* دوره‌ی میان یخبندان

**intergovernmental** /ˌɪntəˌgʌvənˈmentl, US -ərˌgʌvərn-/ *adjective*
لە نێوان حکومەتەکاندا: *an intergovernmental conference* ◌ میان حکومت‌ها

**intergrowth** *noun*
شین بوون لەنێو یەکا، هاوڕووان، لێک ڕووان ◌ رشد درونی

**interim** /ˈɪntərɪm/ *noun, adjective, adverb*
*n* ماوە، دەم، کات *adj* کاتی، بەڕووەخت: *The vice-president took power in the interim period before the election* (کۆن) *adv* = meanwhile ◌ *n* اثنا، حین *adj* موقت

**interior** /ɪn'tɪərɪə(r), US -'tɪr-/ *adjective, noun*
*adj* نێوەکی، نێوخۆیی، ناوخۆیی، ناوەندی، دوور لە سنوور، لە کەنار دوور: *interior walls* n 1 بەشی نێوەوە، ناوان، ناوەڕاست، نێوەوە، هەندەروون، دەروون، هوندر، ژوورەوە 2 ناوچە دوور لە سنوورەکان، ناوچە ناوەندییەکان، ناوچەکانی نێوەوە 3 (وڵاتێ) کاروباری نێوخۆ: *the Department/Minister of the Interior* ◌ *adj* داخلی، مرکزی *n* 1 قسمت داخلی، داخل، تو 2 نواحی مرکزی 3 امور داخلی
**interior decorator** *noun*
نێوەوەڕازێن، جوانکاری ناوەوە، ژوور(ەوە)ڕازێن ◌ طراح داخلی
**interior decorating** *noun*, also interior decoration
ڕازاندنەوەی نێوەوە، جوانکردنی ژوورەوە ◌ طراحی داخلی
**interior design** *noun*
ڕازاندنەوەی نێوەوە، جوانکردنی ژوورەوە ◌ طراحی داخلی
**interior designer** *noun*
نێوەوەڕازێن، جوانکاری نێوەوە، ژوورەوەڕازێن ◌ طراح داخلی
**interiority** /ɪn,tɪrɪ'ɔːrɪti/ *noun*
نێوەکیبوون، لەنێوەوەبوون، دەروونیبوون، لە ناوەوەبوون، نێوەکێتی ◌ داخلی بودن
**interiorly** *adverb*
لە نێوەوە، لە ناوەوە ◌ از داخل
**interjacent** /,ɪntə'dʒeɪsnt/ *adjective*
لەنێو(ان)هەڵکەوتوو ◌ در میان واقع‌شونده
**interjection** /,ɪntə'dʒekʃn, US -tər'dʒ-/ *noun*
دەستەوشە یان وشەی سەرسووڕمان ◌ عبارت یا واژەی تعجبی
**interjectional** /,ɪntə'dʒekdʃnl, US -tər'dʒ-/ *adjective*
1 سەرسووڕهێنەرانە 2 (interjectionally *adv*) parenthetical = ◌ تعجبی
**interjectory** /,ɪntə'dʒektərɪ/ *adjective*
نێوهاوردە، نێوخستە ◌ معترضه
**interlaced** *adjective*
لێکئاڵاو، ئاڵۆسکاو، تێکچنراو، تێکچرژاو ◌ بەهم‌بافته
**interlacement** *noun*
لێکئاڵان، ئاڵۆسکان، لێکهەڵکێشان، پێکاچوون، تێکخران، تێکچنین، تێکچرژان ◌ بەهم‌بافتگی
**interlacing** *adjective*
لێکئاڵاو، ئاڵۆسکاو، لێکهەڵکێشراو، پێکاچوو، تێکخراو، تێکچنراو، تێکچرژاو ◌ بەهم‌بافته
**interlanguage** /'ɪntəlæŋgwɪdʒ, US -tərl-/ *noun*
ناوزمانی، نێوزمانی، نێوانزمانی (تایبەتمەندی هەر دوو زمان(هەم زمانی یەکەم و هەم زمانی لە فێربووندا)ی تیایە ◌ میان‌زبانی
**interlay** /,ɪntə'leɪ/ *noun*
توێی نێوەڕاست، نێو(ان)توێ ◌ لایەی میانی
**interlayer** *noun*
توێی نێوەڕاست، نێو(ان)توێ ◌ لایەی میانی
**interleaf** /'ɪntəliːf/ *noun, pl.* interleaves
نێوپەڕە (پەڕ یان گەڵایەکی سپی کە لە نێو توێی پەڕەکانی کتێبێ دادەنرێ) ◌ برگ میانی
**interleukin** /,ɪntə'luːkɪn/ *noun*
(زیندەکیمیا) دەستەی glycoprotein ـەکان کە لە لایەن خڕۆکە سپییەکانەوە leucocyte بەرهەم دێنرێن، کاردانەوەکانی پاراستنی لەش میزان دەکەن، خێزانی پرۆتینە چکۆلەکان کە بەشداری دەزگای بەرگری لەش دەکەن بە زیادکردنی پەرەسەندن و چالاکاندنی activation خڕۆکە سپییەکانی خوێن ◌ انترلوکین
**interleukin-1** *noun, abbreviation* IL-1
(زیندەکیمیا) ئینتێرلووکینی یەک: ئینتێرلووکینێ کە ب.ت. بەهۆی monocyte و macrophage ـەکانەوە بەرهەم دێتن و کاردانەوەکانی پاراستنی لەش بەهۆی گوڕجکردنی lymphocyte ـەکان و ناوێژایەتی ڕەوت و پرۆسە بایۆلۆژیکییەکانی تر میزان دەکا ◌ انترلوکین یک
**interleukin-2** *noun, abbreviation* IL-2
(زیندەکیمیا) ئینتێرلووکینی دوو: پرۆتینێکی T-cell کە تاوی بەرهەمهێنانی خانەی شێوەT زیاتر و بەرگرییە پاراستنەکانی تر دەدا، و زۆرتر لە بواری immunotherapy بەکاردەهێنرێ ◌ انترلوکین دو
**interlinear** /,ɪntə'lɪnɪə(r), US -tər'l-/ *adjective*
1 نێو(ان)دێری، تێخراو لە نێوان دێڕەکاندا 2 دەقاودەق ◌ 1 بین‌سطری 2 تحت‌اللفظی
**interlineation** *noun*
نووسین یان خستنەنێو دێڕەکانەوە ◌ درج در میان سطور
**interlingu** /,ɪntə'lɪŋgwə/ *noun*
نێوانزمان: 1 زمانێکی دەسکردە کە بۆ وەرگێڕانی دەزگایی یان ماشینی داهێنراوە 2 (Interlingu) زمانێکی دەسکردی نێونەتەوەیی یان جیهانی کە لە توخمە هاوبەشەکانی زمانە ڕۆمییەکان پێکهاتووە ◌ میان‌زبان
**interlingual** *adjective*
1 نێوانزمانی، نێوان یان سەربە دوو زمان 2 سەربە یان پێوەندی بە interlingua وە هەیە ◌ 1 میان‌زبانی 2 وابسته به میان‌زبان یا انترلینگوا
**interlining** *noun*
ناو، نێواخن، ناوبەر، نێوپۆش، بەری نێوەوە ◌ لایی

**interlinked** *adjective*
پێکەوەبەستراو، لێکهەڵپێکراو، پێکەوەگرێدراو، پێکەوەبەند، پێکبەند، پێکبەست ۞ مربوط به هم

**interlinking** *adjective, noun*
*adj* پێکەوەبەستراو، پێکەوەگرێدراو، لێکهەڵپێکراو، پێکەوەبەند، پێکبەند، پێکبەست *n* پێوەندی، تێکەڵی ۞ *adj* مربوط به هم *n* ارتباط

**interlobular** /ˌɪntəˈlɒbjʊlə/ *adjective*
(توێکاری) نێوانپلی، هەڵکەوتوو لە نێوان پلەکاندا lobe ۞ انترلوبیولار

**interlock** /ˌɪntəˈlɒk, US ˌɪntərˈlɑːk/ *noun*
1 پێکەوەبەستراوی، لێکهەڵپێکراوی، بەیەکاچوویی، پێکاچوویی، پێکەوەگرێدراوی، تێکگیراوی، تێکئالاوی، پێکەوەبەندی 2 (کامپیوتێر) قوفڵی نێوەوە، هەڵپێکانی ژوورەوە ۞ 1 درهمقفلشدگی 2 (کامپیوتر) همبند

**interlocked** *adjective*
لێکهەڵپێکراو، پێکەوەبەستراو، لێکگرێدراو، بەیەکاچوو، پێکاچوو، لێکئالاو، تێکگیراو ۞ درهمقفلشده، مربوط به هم

**interlocking** *adjective*
لێکهەڵپێکراو، پێکەوەبەستراو، لێکگرێدراو، لێکئالاو، تێکگیراو ۞ درهمقفلشده، مربوط به هم

**interlocution** /ˌɪntəˈləkjuːʃn/ *noun*
وتوویژ، قسەکردن، دوان، گفتوگۆ، هەڤپەیڤین ۞ مکالمه، گفتگو

**interlocutor** /ˌɪntəˈlɒkjətə(r), US ˌɪntərˈlɑːk-/ *noun*
لەگەڵ قسەکردوو، لەگەڵ دواو ۞ طرف گفتگو

**interlocutory** /ˌɪntəˈlɒkjʊt(ə)ri/ *adjective*
(دەگمەن) سەربە وتوویژ یان دوان ۞ وابسته به گفتگو

**interloper** /ˈɪntələʊpə(r), US ˈɪntərloʊpər/ *noun*
خۆتێهەڵقوتێن، لاپواز، مزاحیم ۞ فضول، مزاحم

**interlude** /ˈɪntəluːd, US -tərl-/ *noun*
1 ئەنتراکت، پشوو، پێل، ماوە، وچان، هەڵوەستە 2 کورتە شانۆ یان موسیقایێ کە لەو ماوەدا پێشکەش دەکرێ ۞ 1 فاصله، انتراکت 2 میانپرده

**interlunar** /ˌɪntəˈluːnə(r)/ *adjective*
سەربە مانگ کەڵبوون (مانگکەلانە) ۞ محاقی

**intermarriage** /ˌɪntəˈmærɪdʒ/ *noun*
ژنومێردایەتی ۞ ازدواج

**intermaxillary** /ˌɪntəˈmæksələri/ *adjective*
نێو(ان)شەویلکەیی، هەڵکەوتوو لە نێوان شەویلکەکان(دا) ۞ میانآروارەای

**intermeddler** *noun*
خۆتێهەڵقوتێن، خۆتێوەردەر ۞ فضول

**intermediacy** /ˌɪntəˈmiːdɪəsɪ/ *noun*
نێوبژیکەری، نێوگژیوانی، ناڤبەری، نێونجیگەری ۞ میانجیگری

**intermedial** = intermediary

**intermediary** /ˌɪntəˈmiːdiəri, US ˌɪntərˈmiːdieri/ *noun* (*pl.* intermediary), *adjective*
*n* ناوبژیوان، یەکخەر، نێوگژیوان، ناڤبەر، ناونجیگەر *adj* 1 نێوبژیکەرانە، یەکخەرانە، نێونجیکەرانە، ناوگژیوانانە 2 ناوەندی، ناوەند، نێوەن، ناوەنی، نێوەڕاست، مابەین، ناوگ، نێوان، ناڤین ۞ *n* میانجی، واسطه *adj* 1 میانجیگرانە 2 بینابین، متوسط

**intermediate** /ˌɪntəˈmiːdiət, US -tərˈm-/ *adjective, noun*
*adj* 1 ناوین، نێوەڕاست، نێوەند، ناوەند، ناوەندی، نێوبڕ، لەنێوان، مابەین، لەبەین 2 مامناوەند، نێونجی، ناونجی، نێوانە، ناوەندی، هەڵکەوتوو لە نێوان دوو شتدا *n* 1 ناوبژیوان، یەکخەر، نێوگژیوان، ناڤبەر، ناونجیکار 2 ناونجی: ئاوێتەیێکی کیمیایی کە بەهۆی کاردانەوەیێک و پاشان بەشداری لە دانەیێکی تردا پێکهاتووە ۞ *adj* 1 میانی، متوسط، میانه، وسطی 2 میانجی، متوسط *n* 1 میانجی، واسطه 2 (شیمی) واسطه

**intermediately** /ˌɪntəˈmiːdiətli, US -tərˈm-/ *adverb*
لە نێوەڕاستدا، نێوەڕاستانە ۞ به طور متوسط

**intermediate-range (ballistic) missile** *noun*
مووشەکی نێوانهاوێژ (لە نێوانlong-range و short-range دا) ۞ موشک میانبرد

**intermediate technology** *noun*
تێکنۆلۆژی نێوانە یان مامناوەند، تێکنۆلۆژی ناوین ۞ فناوری میانی

**intermediation** /ˌɪntəmiːdɪˈeɪʃn/ *noun*
نێونجیگەری، نێوبژیوانی، نێوگژیکەری، ناوەندیگەری، ناڤبەری، یەکخستن، دەستێخستن، خۆتێوەردان، intervention، mediation ۞ میانجیگری، دخالت

**intermediator** *noun*
یەکخەر، ناونجیگەر، ناوگژیوان، نێونجی، نێوەن، ناوەند، ناوبژیکەر، ناڤبەر ۞ میانجی

**intermedium** *noun, pl.* intermedia
نێوانە، نێوانگیر، نێوگر، ناوەند، نێونجی ۞ میانجی

**interment** /ɪnˈtɜːmənt, US -ˈtɜːrm-/ *noun*
ناشتن، بەخاک سپاردن، ڤەشارتن ۞ تدفین

**intermezzo** /ˌɪntəˈmetsəʊ, US ˌɪntərˈmetsoʊ/ *noun, pl.* intermezzi /-ˈmɛtsi/ or intermezzos
نێوانپەردە، کورتە موسیقایێ کە لە ماوەی دوو

پێرفۆرمانس‌دا پێشکەش دەکرێ ◇ میان‌پرده
**interminable** /ɪnˈtɜːmɪnəbl, US -ˈtɜːrm-/ *adjective*
دوور و درێـژ (و وەڕەزکـەر)، ماوەیـەکی زۆر، تەواونـەبوو، کۆتـایی‌پێنـەهاتوو، بـێ‌کۆتـایی، لەدوایی‌نەهاتوو ◇ طولانی، پایان‌ناپذیر
**interminableness** *noun*
دوور و درێـژی (و وەڕەزکـەر)، تەواونـەبوویی، لـەبن‌نـەهاتوویی، کۆتـایی‌پێنـەهاتوویی، لەدوایی‌نەهاتوویی ◇ پایان‌ناپذیری
**interminably** /-əbli/ *adverb*
تەواونەبووانە، زۆر خایاندوو، ماوەیەکی زۆر، بە چەندین سـەعات: *The meeting dragged on interminably* ◇ به طور بی‌پایان
**interminate** *adjective*
بێ‌دوایی، دوایی‌پێنەهاتوو، تەواو نابێ ◇ بی‌پایان
**intermission** /ˌɪntəˈmɪʃn, US -tərˈm-/ *noun*
هەڵوەسـتە، پشـوو، وچان، ئینتیرڤاڵ ◇ آنتراکـت، وقفه، فاصله
**intermittence** /ˌɪntəˈmɪtəns, US -tərˈm-/ *noun*
پارچەپارچەبوون، پچڕپچڕبوون، پرووسکان ◇ تقطع
**intermittent** /ˌɪntəˈmɪtənt, US -tərˈm-/ *adjective*
تاوتـاو، پچڕپچـڕ، نایەکبینـە، نەلەسـەریەک، ناهەمیشە، جاروبار، ناوەناوە، بەنۆرە، جارجارە، *intermittent bursts of applause* :sporadic ◊ *intermittent showers* ◇ متناوب
**intermittent fever** *noun*
نۆبەتـا، نۆبـەتێ (تاوتـاو)، تـای تاوتـاو، تاوەتـا، جارەتێ ◇ تب متناوب
**intermittently** /ˌɪntəˈmɪtəntli, US -tərˈm-/ *adverb*
تاوتاو، تاوەتاوە، تاوتاوانە، بە نۆرە: *Protests continued intermittently throughout November* ◇ به طور متناوب
**intermixable** *adjective*
لەتێکەڵ‌هاتوو، تێکەڵ دەکرێ، لێک دەدرێ ◇ مخلوط‌پذیر
**intermixture** /ˌɪntəˈmɪkstʃə(r), US -tərˈm-/ *noun*
تێکەڵە، ئاوێتە، لێکدراوە ◇ مخلوط، آمیزه
**intermolecular** /ˌɪntəməˈlekjələ(r)/ *adjective*
نێوگەردی، نێوان‌گەردی ◇ بین مولکولی
**intermolecular attraction** *noun*
راکێشـانی نێو(ان)گەردی ◇ جاذبەی بین مولکولی
**intermolecular rearrangement** *noun*
ڕێکخسـتنەوەی نێـو(ان)گـەردی ◇ نـوآرایی بـین مولکولی
**intermontane** /ˌɪntəˈmʌndeɪn/ *adjective*
نێو(ان)چیایی، هەڵکەوتوو لە نێوان دوو چیادا، نێوان‌کێوی ◇ میان‌کوهی
**intermural** /ˌɪntəˈmjʊrəl/ *adjective*
نێو(ان)دیواری، هەڵکەوتوو لە نێوان دیوارەکان‌دا ◇ میان‌دیواری
**intern** /ˈɪntɜːn, US ˈɪntɜːrn/ *noun*
ئینتێـرن (= تـازە دوکتـۆرێ کـە خەریکـە ڕاهێنانەکەی تـەواو دەکـا و لـە نـەخۆشخانـەدا دەمێنێتـەوە و وەک یاریـدەدەری دوکتـور و برینکارەکان کار دەکا) ◇ انترن
**internal** /ɪnˈtɜːnl, US ɪnˈtɜːrnl/ *adjective*
1 نێوخـۆیی، نـاوخۆ، لـەنێوەوە، ژوورەوە، لـە ناوەوە، نێوەوە(یی): *internal affairs* ◊ *-ernal affairs/trade* 2 نێوەوەی لەش، هەناو 3 سـەربە کاروبار یان چالاکی‌یەکانی نێوخۆی وڵاتێ 4 هـەناوی، زاتی، نێـوەکی، خۆمـاکی، ژوورەکـی، هۆشی، زەینی، نابابەتی: *internal stimulus* ◇ 1 داخلـی 2 داخـل بـدن 3 وابسـته بـه امـور یـا فعالیت‌های دخلەی کشور 4 باطنی، ذاتی، ذهنی
**internal antagonism** *noun*
ناکۆکی نێوەکی، دژایەتی لە نێوەوە ◇ تعارض درونی
**internal combustion** *noun*
لەنێوەوە سووتاو، سووتانی نێوەکی، نێوەسـووت ◇ درون‌سوز
**internal combustion engine** *noun*
بزوێنەی نێوەسووت، مۆتۆری لەنێوەوە سـووتاو ◇ موتور درون‌سوز
**internal energy** *noun*
وزەی نێوەکی ◇ انرژی درونی
**internal exile** *noun*
دوورخستنەوە لە نێوەوەی وڵاتا ◇ تبعید داخلی
**internality** /ɪntɜːˈnælɪtɪ, US ɪntɜːrˈn-/ *noun*
لـەنێوەوەبوون، لـەژوورەوەبوون، نێـوەکێتی ◇ داخلیت
**internalization** /ɪnˌtɜːnəlaɪˈzeɪʃn, US -ˌtɜːrnələˈz-/ *noun*
داکوتانـدن، دەروونی کـردن، نێـوگیرکردن، تێچوون ◇ درونی‌سازی
**internally** /-nəli/ *adverb*
1 لـە نێـو(ەوە)، لـە ژوورەوە 2 بـە شـێوەیەکی هەناوی ◇ 1 از داخل 2 ذاتاً
**internal market** = single market
**internal medicine** *noun*
پزشکیی نێوخۆیی، نۆژداریی نێوەکی ◇ طب داخلی
**Internal Revenue Service** *noun*, also internal revenue

بەڕێوەبەری یان کەرتی باجی نێوخۆیی ◌ ادارەی مالیات‌های داخلی

**international** /ˌɪntəˈnæʃnəl, US -tərˈn-/ *adjective, noun*

*adj* 1 نێونەتەوەیی، جیهانی، جەهانی، نێودەوڵەتی 2 (International) ئینتێرناسیۆناڵ، نێودەوڵەتی (یەکێ لە چوار کۆمەڵەی سۆسیالیستی یان کۆمۆنیستی بۆ کرێکارانی هەموو دنیا، و لە ساڵانی 1864، 1889، 1919 و 1937 گیرا) *n* 1 پێشبڕکێی نێونەتەوەیی 2 یاریزانی تیپی نیشتمانی ◌ *adj* 1 بین‌المللی 2 (با I) بین‌الملل *n* 1 مسابقەی بین‌المللی 2 ملی‌پوش

**international competition** *noun*

پێشبڕکێی نێونەتەوەیی ◌ مسابقەی بین‌المللی

**International Date Line** *noun*

هێڵی نێونەتەوەیی ڕێکەوت ◌ خط بین‌المللی تاریخ

**the Internationale** /ˌɪntənæʃəˈnɑːl, US -tərn-/ *noun*

1 سروودی ئینتێرناسیۆناڵ International 2 ◌ سرود انترناسیونال

**internationalism** /ˌɪntəˈnæʃnəlɪzəm, US -tərˈn-/ *noun*

1 جیهانگەری، هاوکاری جیهانی (باوەڕێ کە گشت ولاتانی جیهان دەبێ پێکەوە کار بکەن و یارمەتی یەکتر بدەن) 2 بنەماکانی هەریەک لە چوار International ◌ 1 جهان‌گرایی، تشریک مساعی جهانی 2 اصول هر یک از چهار انترناسیونال

**internationalist** /ˌɪntəˈnæʃnəlɪst, US -tərˈn-/ *noun, adjective*

*n* جیهانگەر، لایەنگری باوەڕی هاوکاری جیهانی *adj* جیهانگەری‌یانە ◌ *n* جهان‌گرا *adj* جهان‌گرایانه

**internationality** /ɪntəˌnæʃənælɪtɪ, US -tərˌn-/ *noun*

نێونەتەوەیی‌بوون، نێونەتەوەیێتی ◌ بین‌المللی بودن

**internationalization** /ˌɪntəˌnæʃnəlaɪˈzeɪʃn, US -tərˌnæʃnələˈz-/ *noun*

نێونەتەوەیی‌کردن، جیهانی‌کردن ◌ (عمل) بین‌المللی کردن

**internationally** /-nəli/ *adverb*

لەباری نێونەتەوەیی(یەوە): *internationally famous* ◌ از لحاظ بین‌المللی

**international low** *noun*

قانوونی جیهانی یا نێونەتەوەیی ◌ قانون بین‌المللی

**international market** *noun*

بازاڕی جیهانی ◌ بازار جهانی

**International Monetary Fund** *noun*

سنووقی پارەی جیهانی (جەهانی پارە) ◌ صندوق پولی جهانی

**International Phonetic Alphabet** *noun*

ئەلفوبێی دەنگ(ناس)ی جیهانی، ئەلفوبێی فۆنێتیکی نێونەتەوەیی (ئای‌پی‌ئەی) ◌ الفبای آوانگار بین‌المللی

**international relations** *noun, pl.*

پێوەندی‌یە نێونەتەوەیی‌یەکان، پێوەندی‌یەکانی نێونەتەوەیی ◌ روابط بین‌المللی

**international pitch** = concert pitch

**international style** *noun*

شێوازی جیهانی یان نێونەتەوەیی (بیناسازی، لە سەدەی بیستەمدا و بەپێی سەرنجدان بە تایبەتمەندی خۆجێیی) ◌ سبک بین‌المللی

**international trade** *noun*

بازرگانی یا کارداری جیهانی ◌ تجارت جهانی

**international system of units** *noun*

دەزگای جیهانی یەکەکان ◌ سیستم بین‌المللی واحدها

**international unit** *noun*

یەکەی جیهانی یا نێونەتەوەیی ◌ واحد بین‌المللی

**interne** = intern

**internecine** /ˌɪntəˈniːsaɪn, US -tərˈn-/ *adjective*

یەکترکوژ، دوولاقڕکەر، وێرانی و خاپووری بۆ هەر دوو لا، ماڵوێرانکەر بۆ هەر دوو لا: *internecine struggles/warfare/feuds* ◌ نابودی و انهدام برای هر دو طرف

**internee** /ˌɪntɜːˈniː, US ˌɪntɜːrˈniː/ *noun*

گیراوی سیاسی، گیراوی سەردەمی شەڕ، گیراو یان دیلی شەڕ، دەس‌بەسەر ◌ زندانی سیاسی، زندانی زمان جنگ، اسیر جنگی

**internet** /ˈɪntənet, US -tərn-/ *noun*

ئینتێرنێت (لە -inter + network پێکهاتووە) ◌ اینترنت

**interneuron** /ˌɪntəˈnjʊərɒn/ *noun*, also interneurone /-rəʊn/

نۆرۆنی بەستەر ◌ انترنیورون

**interneuronal** *adjective*

سەربە نۆرۆنی بەستەر ◌ وابسته به انترنیورون

**internist** /ɪnˈtɜːnɪst, US -ˈtɜːrn-/ *noun*

ئینتێرنیست، پسپۆڕی نەخۆشی‌یەکانی نێوەوە (دوکتۆرێ کە زانیاری‌یەکی گشتی لەبارەی نەخۆشی و ئەندامانی نێوەوەی لەشەوە هەیە و چارەسەری خۆی بێ نەشتەرگەری دەکا) ◌ انترنیست

**internment** /ɪnˈtɜːnmənt/ *noun*

1 گرتن، دەس‌بەسەرکردن، گلدانەوە (ب.ت. لە ماوەی شەڕدا) 2 گرتووخانە، زیندان: *-rnment camps* ◌ 1 بازداشت، توقیف 2 حبس

**internode** /ˈɪntənəʊd/ *noun*

(ڕووەکناسی) بەشی نێوان گرێکان، نێوگرێ ◌

انترنود

**internuclear** *adjective*
نێوان‌نێوکی، نێوناوکی، نێوان ناوکەکان ◌ میان‌هسته‌ای

**internuncial** /ˌɪntəˈnʌnʃ(ə)l/ *adjective*
(کارئەندامناسی) بەستەر ◌ رابط

**internship** /ˈɪntɜːnʃɪp, US -tɜːrn-/ *noun*
ئینتێرنشیپ ◌ انترنشیپ

**interoceanic** *adjective*
نێوان‌ئۆقیانووسی، دوو ئۆقیانووس پێک‌دەبەستێتەوە ◌ میان‌اقیانوسی

**interoceptive** /ˌɪntərəʊˈseptɪv/ *adjective*
سەربە نێوەبزوێنەر یان بزوێنەری نێوەوە ◌ وابسته به محرک درونی

**interoceptor** *noun*
نێوەبزوێنەر، بزوێنەری نێوەوە، بزوێنەری نێوەکی ◌ محرک درونی

**interosculation** /ˌɪntərɒskjəˈleɪʃn/ *noun*
پێکەوەبەستراوی، لێک‌هەڵپێکراوی، پێکەوەگرێدراوی ◌ بهم‌پیوستگی

**interosseous** /ˌɪntərˈɒsɪəs/ *adjective*
(تویکاری) هەڵکەوتوو لە نێوان ئێسکەکاندا، نێوان‌ئێسکی ◌ واقع در میان استخوان‌ها

**interpellant** /ˌɪntəˈpelənt/ *adjective*
لێ‌پرس(ەوە)، پرسیارلێکەر ◌ استیضاح‌کننده

**interpellation** /ɪnˌtɜːpeleɪʃn/ *noun*
لێ‌پرسینەوە، پرسیارلێکردن (ب.ت. فەرەنسە و ژاپۆن) ◌ استیضاح

**interpellator** *noun*
لێ‌پرس(ەوە)، پرسیارلێکەر ◌ استیضاح‌کننده

**interpenetration** /ˌɪntəˌpenɪˈtreɪʃn, US -tərˌp-/ *noun*
تێک‌هەڵکێشان، تێک‌هەڵکێشران، بوونەیەک، تێکەڵبوون، چوونەنێویەک، پێکاچوون: *the increasing interpenetration of the public and private sectors* ◌ ادغام، نفوذ متقابل، درهم‌تنیدگی

**interpenetrating** *adjective*
پێکاچوو، بەیەکاچوو، ناویەکچوو، تێک‌هەڵکێشراو ◌ متداخل

**interpersonal** /ˌɪntəˈpɜːsənl, US -tərˈpɜːrs-/ *adjective*
نێوان تاکەکان، نێو(ان)تاکی، لە نێوان دوو کەس‌دا، نێوان‌کەسی: *interpersonal skills* ◌ میان‌فردی

**interphase** *noun*
(زیندەناسی) نێو(ان)ڕوو، ئینتێرفەیز: قۆناخێک لە سووڕی خانەیی کە لەو قۆناخەدا خانە دابەش نابێ. قۆناخی میتابۆلی خانە و قۆناخی دوای کۆتاڕووی telophase دابەش‌بوونی کە تا قۆناخی پێش‌ڕوو prophase دابەش‌بوونی دواتر بەردەوام دەبێ، بە درێژایی ئەم قۆناخە هاوتاسازی DNA یش دەکرێ (یان ئەنجام دەدرێ) ◌ انترفاز

**interphase nucleus** *noun*
ناوکی نێو(ان)ڕوو، ناوکی ئینتێرفاز: قۆناخێکی نێوان دوو میتۆز لە سووڕی خانەیی‌دا کە لەودا کرۆمۆزۆمەکان لە دۆخی پێچاوپێچی‌یە دێنە دەرێ و لە نێو ناوکێکی پەردەداردا دەبەسرێتەوە و هاوتاسازی‌یان دەس پێدەکا ◌ هسته‌ی انترفاز

**interplanetary** /ˌɪntəˈplænɪtri, US ˌɪntərˈplænəteri/ *adjective*
نێو(ان)هەسارەیی، نێوان هەسارەکان: -*lanetary travel* ◌ میان‌سیاره‌ای

**interplay** /ˈɪntəpleɪ, US -tərp-/ *noun*
کارلێک(کردن)، پەرچەکردار، کاریگەری دوولایەنە ◌ تأثیر متقابل

**Interpol** /ˈɪntəpɒl, US ˈɪntərpoʊl/ *noun*
(لە فەرەنسە) پۆلیسی نێودەوڵەتی (بنەڕەت: لە *Inter(national) pol(ice)* پێکهاتووە) ◌ پلیس بین‌المللی

**interpolar** *adjective*
نێو(ان)جەمسەری، نێوان دوو جەمسەر ◌ میان‌قطبی

**interpolation** /ɪnˌtɜːpəˈleɪʃn, US -ˌtɜːrp-/ *noun*
1 دەسکاری، دەس‌تێوەردان، شێواندن، تێکدان 2 شتی زیادکراو، سەرخستە، شتی تێخراو (بە دەقەوە) ◌ 1 تحریف 2 چیز افزوده

**interposal** /ˌɪntəˈpəʊzl, US ˌɪntərˈpoʊzl/ *noun*
1 ناوبژی، نێوگژی، ناقبەری، نێونجی‌گەری 2 دەس‌تێوەردان، دەس‌تێخستن ◌ 1 میانجی‌گری 2 دخالت

**interposition** /ˌɪnt(r)əpəˈzɪʃn/ *noun*
1 نێوبژی، نێوگژی، ناقبەری، نێونجی‌گەری 2 دەس‌تێوەردان، دەس‌تێخستن ◌ 1 میانجی‌گری 2 دخالت

**interpretablility** /ɪnˈtɜːprɪtəbl, US -ˈtɜːrp-/ *noun*
لەوەرگێرانهاتوویی ◌ ترجمه‌پذیری

**interpretable** /ɪnˈtɜːprɪtəbl, US -ˈtɜːrp-/ *adjective*
لەوەرگێرانهاتوو، وەردەگێردرێتەوە: *interpretable data* ◌ ترجمه‌پذیر

**interpretation** /ɪnˌtɜːprɪˈteɪʃn, US -ˌtɜːrp-/ *noun*
1 روونکردنەوە، رۆشنکردنەوە، لێکدانەوە، واتالێکدانەوە، راقە، شیکردنەوە، شرۆڤەکردن: *Her evidence suggests a different interpretation of the events* ◊ *It is not possible for everyone to put their own*

وەرگێـڕان 2 *interpretation on the law* (زارەکی یان هاوکات) ◌ 1 توضیح، تفسیر، تعبیر 2 ترجمە
**interpretative** /ɪn'tɜ:prɪtətɪv, US ɪn'tɜ:rprəteɪtɪv/ *adjective*, also interpretive /ɪn'tɜ:prɪtɪv, US -'tɜ:rp-/
لێکدانەوەیی، شیکارانە، شیکردنەوەیی: *an -ive exhibition* ◊ *an terpretative problem* (interpretatively *adv*) ◌ تفسیری
**interpreter** /ɪn'tɜ:prɪtə(r), US -'tɜ:rp-/ *noun*
1 وەرگێـڕ (زارەکی)، دیلمانج، تەرجومان 2 شیکەرەوە، راڤەکار، لێکدەرەوە ◌ 1 مترجم (شفاهی) 2 مفسر
**interpreting** *noun*
وەرگێڕان (زارەکی یان هاوکات) ◌ ترجمە
**interprovincial** *adjective*
نێو(ان)هەرێمی ◌ انترپرووینسیال
**interracial** /ˌɪntə'reɪʃl/ *adjective*
نێو(ان)رەگەزی، نێوانـنژادی، نێوان چەندین رەگەز ◌ میاننژادی
**interregnum** /ˌɪntə'regnəm/ *noun*, *pl.* -erregnums or interregna /-nə/
1 سەردەمی فیترەت، سەردەمی حکومەتی کاتی 2 قۆناخ یان سەردەمی نائاسایی 3 هەڵوەستە، وچان، مەودا، پشوو، ماوە، میانە ◌ 1 دورەی فترت 2 مرحلەی غیرعادی 3 وقفە، مکث، فاصلە
**interrelated** *adjective*
پێکەوەبەستراو، پێکەوەگرێدراو، سەربەیەکتر، پێکەوەپێوەندیدار، یەکگرتوو، پێکەوەبەند ◌ درهم‌تنیدە، بەهم‌پیوستە، مربوط بە هم
**interrelatedness** *noun*
پێکەوەبەستراوی، پێکەوەگرێدراوی، سەربەیەکتربوون، یەکگرتوویی، پێکەوەبەندی ◌ درهم‌تنیدگی، بەهم‌پیوستگی
**interrelation** /ˌɪntərɪ'leɪʃn/ *noun*
پێکبەندی، بەستراوی، پێکەوەبەستراوی، پێوەندی، گرێدایی، تێکەڵی، پێوەندی دوولایەنە ◌ mutual or reciprocal relation رابطە
**interrelationship** /ˌɪntərɪ'leɪʃnʃɪp/ *noun*
پێوەندی، تێکەڵی، پێوەندی دوولایەنە، هاوپێوەندی ◌ ارتباط، روابط متقابل
**interrogation** /ɪnˌterə'geɪʃn/ *noun*
1 لێپرسینەوە: *He confessed after four days under interrogation* 2 پرسیار 3 نیشانەی پرسیار ◌ 1 بازجویی 2 سؤال 3 علامت سؤال
**interrogation mark** *noun*, also interrogation point
نیشانەی پرسیار، پرسەنیشان (؟، شێوەی گوێ) ◌ علامت سؤال
**interrogative** /ˌɪntə'rɒgətɪv, US -'rɑ:g-/ *adjective, noun*
*adj* پرسیاری، پرسیارکار، پرسیارلێکەر، پرسیارکارانە: *an interrogative gesture/remark/sentence* ◊ *interrogative n pronouns/determiners/adverbs* 1 شێوگی پرسیاری 2 جێناوی پرسیاری، پرسەجێناو 3 وشەی پرسیاری ◌ *adj* سؤالی، استفهامی، پرسشی، پرسشگر، پرسشگرانە *n* 1 صورت پرسشی 2 ضمیر پرسشی 3 کلمەی پرسشی
**interrogative adverb** *noun*
ئاوەڵکاری پرسیاری ◌ قید پرسشی
**interrogatively** /ˌɪntə'rɒgətɪvli, US -'rɑ:g-/ *adverb*
بە شێوەیەکی پرسیاری ◌ بە طور پرسشی
**interrogative pronoun** *noun*
بریناو یان جێناوی پرسیاری، راناوی پرسیاری، پرسەجێناو ◌ ضمیر پرسشی
**interrogator** *noun*
لێپرس(کار)، پرسیارکەر ◌ بازپرس، پرسش‌کنندە
**interrogatory** /ˌɪntə'rɒgətri, US -'rɑ:g-/ *adjective, noun* (*pl.* interrogatories)
*adj* پرسیارکەرانە، پرسیارکارانە *n* (مـاف) پرسیارنامە، پرسیار، لیستی لێپرسینەوە ◌ *adj* پرسش‌گرانە *n* پرسش‌نامە، پرسش
**interrupted** *adjective*
دابڕاو، پچڕاو، پچڕپچڕ ◌ گسیختە
**interrupter** *noun*, also interruptor
1 ملۆزم 2 تەزووبڕ، تەوژمبڕ، دابڕە ◌ 1 مزاحم 2 قطع‌کنندەی جریان برق
**interruption** /ˌɪntə'rʌpʃn/ *noun*
1 بڕین، دابڕین، دابڕان، پسان، پچڕان، قرتان، لەتکردن 2 پشوو، وچان، ماوە 3 ملۆزمی ◌ 1 قطع، گسیختگی، انقطاع 2 وقفە 3 مزاحمت
**interruptive** *adjective*, also interruptory
کۆسپ، گیرەوە، تەگەرە، لەمپەر ◌ مانع، بازدار
**interscapular** /ˌɪntə'skæpjələ(r)/ *adjective*
نێوان دوو شان، نێوشان، ناوشان ◌ بین‌الکتفین
**inter se** /ˌɪntə 'seɪ/ *adjective*
(لاتین) لەنێوان خۆیاندا ◌ در میان خودشان
**intersecting** *adjective*
یەکتربڕ، هاوبڕ، خاچواری ◌ متقاطع
**intersection** /ˌɪntə'sekʃn, US -tər's-/ *noun*
1 یەکتربڕین، هاوبڕی 2 چوا(ر)ڕیانە، چوارڕێیان، دوڕیان، دووڕێیان، شوێنی یەکتربڕین، خاڵی یەکتربڕین، جەمسەر ◌ 1 تقاطع 2 محل تقاطع
**intersectional** /ˌɪntə'sekʃənl, US -tər's-/ *adjective*
سەربە intersection ◌ وابستە بە intersection

**interseptal** /ˌɪntəˈseptl *adjective*
نێو(ان)پەنچکی، نێوان پەردەی پەنچک ۞ میاندیافراگمی

**intersex** /ˈɪntəseks, US -tərs-/ *noun*
ئینتێرسێکس، نێرمێ، نێرەمووک، نێرمایی ۞ میانجنسی

**intersexual** /ˌɪntəˈsekstʃuːəl/ *adjective*
ئینتێرسێکشوال، نێرەمووکی، دووڕەگەزی ۞ میانجنسی

**intersexuality** *noun*
ئینتێرسێکشوالیتی، نێرەمووکیتی، دووڕەگەزیتی ۞ میانجنسیت

**interspace** /ˈɪntəspeɪs, US ɪntəˈspeɪs/ *noun*
ماوە، بۆشایی، مەودا ۞ فاصله

**interspatial** /ˌɪntəˈspeɪʃl/ *adjective*
مەودایی، ماوەیی، بۆشاییانە ۞ فاصله‌ای

**interspecific** /ˌɪntəspəˈsɪfɪk/ *adjective*
(زیندەناسی) نێو(ان)جۆری، هەڵکەوتوو یان پێکهاتوو لە نێوان جۆرەکاندا: *interspecific hybrid* ۞ میاننوعی

**interspersion** /ˌɪntəˈspɜːʃn/ *noun*
بڵاوەبوون، پرژان ۞ پراکندگی

**interspinal** /ˌɪntəˈspaɪnl/ *adjective*, also interspinous /ˌɪntəˈspaɪnəs/
هەڵکەوتوو لە نێوان مۆرەکانی پشت ۞ واقع در میان مهره‌های پشت

**interstadial** /ˌɪntəˈsteɪdɪəl/ *adjective, noun*
*adj* (زەویناسی) سەربە قۆناخی پچووکتری ناووهەوایی کەمێ سارد بەدرێژایی قۆناخی سەهۆڵبەندان *n* ئەو قۆناخە ۞ انتراستادیال

**interstate** /ˈɪntəsteɪt, US -tərs-/ *adjective*
نێوانهەرێمی، نێوهەرێمی، نێوانئەیالەتی، نێوانستەیتی ۞ بین ایالتی

**interstellar** /ˌɪntəˈstelə(r), US -tərˈst-/ *adjective*
نێو(ان)ئەستێرەیی، هەڵکەوتوو یان ڕووداو لە نێوان ئەستێرەکاندا، ب.ت. هی کاکێشانی ڕێگای شیری Milky Way ۞ میانستاره‌ای

**interstice** /ɪnˈtɜːstɪs, US -ˈtɜːrs-/ *noun*
قەڵەش، درز، قڵیش، کون، کەلێن، مەودا ۞ شکاف، ترک، فاصله

**interstitial** /ˌɪntəˈstɪʃl, US -tərˈs-/ *adjective*
1 قەڵەشاوی، درزاوی 2 هەڵکەوتوو لە نێوان قەڵەشی شانەی زیندوودا: *interstitial cells* ۞ 1 فاصله‌دار 2 انترستیتیال

**intersubjective** *adjective*
نێوانزەینی، نێوانسابجەکتیف، نێوانسوبژێکتیف ۞ بیناذهنی

**intersubjectively** *adverb*
لەباری نێوانزەینی(یەوە) ۞ از لحاظ بیناذهنی

**intersubjectivity** *noun*
نێوانزەینییەت، نێوانسابجەکتیڤیتی، نێوانسوبژێکتیڤیتی ۞ بیناذهنیت

**intertestamental** *adjective*
نێوان دووپەیمان، نێودووپەیمان ۞ بین‌العهدین

**intertextual** /ˌɪntətekstʃuˈæl, US ˌɪntər-/ *adjective*
نێواندەقی ۞ بینامتنی، میانمتنی

**intertextuality** /ˌɪntətekstʃuˈæləti, US ˌɪntər-/ *noun*
نێواندەقیتی، پێوەندی نێوان دەقەکان ب.ت. دەقە وێژەییەکان literary texts ۞ بینامتنیت، میانمتنیت

**intertextually** *adverb*
لەباری نێواندەقی(یەوە) ۞ از لحاظ بینامتنی یا میانمتنی

**intertexture** /ˌɪntəˈtekstʃə(r)/ *noun*
تێکئالان، لێکئالاوی، لێکهەڵکێشران، تێکەڵبوون، تێکچرژان ۞ درهم‌بافتگی

**interthreaded** *adjective*
تێکئالاو، لێکئالاو، لێکهەڵکێشراو، تێکچرژاو ۞ به‌هم‌بافته

**intertidal** /ˌɪntəˈtaɪdl/ *adjective*
نێوانکێشاوی، ئینتێرتایداڵ (intertidally *adv*) ۞ میانکشندی

**intertribal** /ˌɪntəˈtraɪbl/ *adjective*
نێو(ان)خێڵی، نێوانهۆزی، نێوان هۆزەکان ۞ میانقبیله‌ای

**interurban** /ˌɪntərˈɜːbən/ *adjective*
نێوان شارەکان، نێو(ان)شاری، هەڵکەوتوو لە نێوان شارەکاندا ۞ بین‌شهری

**interval** /ˈɪntəvl, US ˈɪntərvl/ *noun*
1 ماوە، پشوو، وچان، مەودا، هەڵوەستە، میانە، پێل، ئینتێرمیسیۆن، ئینتێرڤاڵ: *She's delirious, but has lucid intervals* 2 مەودا، دووری 3 (موسیقا) جیاوازی چین pitch (بەرزی و نزمی دەنگ): *an interval of one octave* ۞ 1 فاصله، وقفه، مدت، آنتراکت 2 فاصله 3 فاصله، اختلاف دانگ

**intervener** *noun*
خۆتێوەردەر، دەستێخەر، خۆتێکەڵکەر ۞ مداخله‌کننده

**intervening** /ˌɪntəˈviːnɪŋ, US -tərˈv-/ *adjective*
لە ماوەی، لە میانەی، لە نێوان: *Little had changed in the -ervening years* ۞ در طول

**intervenient** /ˌɪntəˈveɪnjənt/ *adjective*
خۆتێوەردەر، دەستێخەر، خۆتێکەڵکەر، لەنێوانداهاتوو ۞ مداخله‌کننده

**intervention** /ˌɪntəˈvenʃn, US -tərˈv-/ *noun*

دەس‌تێوەردان، خۆتێکەڵ کردن، خۆتێهەڵ کوتان، دەس‌تێخستن، مایی تێکردن: *armed/military intervention* ◊ دخالت، مداخله

**interventional** *adjective*
سەربە intervention ◊ وابستە بە intervention

**interventionism** /ˌɪntəˈvenʃənɪzəm, US -tərˈv-/ *noun*
رامیاری یان سیاسەتی دەس‌تێوەردان، دەس‌تێوەردەری ◊ مداخله‌جویی

**interventionist** /-ʃənɪst/ *noun, adjective*
*n* دەس‌تێوەردەر *adj* دەس‌تێوەردەرانە ◊ *n* مداخله‌جو *adj* مداخله‌جویانه

**interventionist policies** *noun, pl.*
رامیاری یان سیاسەتە دەس‌تێوەردەرانەکان، سیاسەتەکانی دەس‌تێوەردان ◊ سیاست‌های مداخله‌جویانه

**intervertebral** /ˌɪntəˈvɜːtɪbr(ə)l/ *adjective*
نێوان‌بڕبڕەیی، هەڵکەوتوو لە نێوان مۆرەکاندا ◊ میان‌فقراتی

**interview** /ˈɪntəvjuː, US -tərv-/ *noun*
چاوپێکەوتن، دیمانە، وت‌وویێژ، هەڤپەیڤین، دیدەنی، دیدار: *to be called for (an) interview* ◊ مصاحبه، گفت‌گو

**interviewee** /ˌɪntəvjuːˈiː, US -tərv-/ *noun*
دیمانەلەگەڵ‌کراو، چاوپێکەوتوو، چاوپێکەوتن‌لەگەڵ‌کراو ◊ مصاحبه‌شونده

**interviewer** /ˈɪntəvjuːə(r), US -tərv-/ *noun*
دیمانەسازدەر، دیمانەڕێکخەر، دیدارکار، چاوپێکەوتن‌کار ◊ مصاحبه‌کننده

**interwar** /ˌɪntəˈwɔː(r), US -tərˈw-/ *adjective*
نێوان دوو شەڕ (شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانی) ◊ بین دو جنگ

**interwove** /-ˈwəʊv, US -ˈwoʊv/ = past of interweave

**interwoven**[1] /ˌɪntəˈwəʊvn, US -ˈwoʊvn/ *adjective*
تێک‌ئالاو، لێک‌ئالاو، لێک‌ئالۆسکاو، تێک‌چرژاو، بەستراو، پێکەوەبەستراو، پێکەوەگرێدراو، یەک‌گرتوو، پێک‌بەست، پێکەوەبەند، لێک‌هەڵنەبچڕاو، لێکەوەنەبوو، یەکدی‌گیر، لێک‌گیر ◊ به‌هم‌بافته، درهم‌آمیخته، درهم‌تنیده

**interwoven**[2] /ˌɪntəˈwəʊvn, US -ˈwoʊvn/ = past participle of interweave

**intestacy** /ɪnˈtestəsi/ *noun*
ڕانەسپاردوویی، وەسیەت‌نەکردوویی، بێ‌وەسیەتی، بێ‌وەسیەت مردن: *the law of intestacy* ◊ بی‌وصیتی

**intestate** /ɪnˈtesteɪt/ *adjective, noun*
*adj* ڕانەسپاردوو، بێ‌وەسیەت، وەسیەت‌نەکردوو *n* کەسێکی وەسیەت‌نەکردوو ◊ *adj* بدون وصیت *n* آدم وصیت‌نکرده

**intestinal** /ɪnˈtestɪnl, US ˌɪnteˈstaɪnl/ *adjective*
ڕیخۆڵەیی، سەربە ڕیخۆڵە، ناوزگ (intestinally *adv*) ◊ روده‌ای

**intestinal fortitude** = courage, stamina

**intestine**[1] *adjectiv*
internal: *intestine war* نێوخۆیی، ◊ داخلی

**intestine** /ɪnˈtestɪn/ *noun*, also intestines
(لە لاتینەوە) ڕیخۆڵە، ڕووقی ◊ روده

**intifada** /ˌɪntɪˈfɑːdə/ *noun*
ڕاپەڕین، سەرهەڵدان (ڕاپەڕینی فەلەستینییەکان بەدژی داگیرکاری ئیسرائیل لە کەناری ڕۆژاوای کەرتی غەزە، لە 1987 دەستی‌پێکرد، بنەڕەت: لە *intifāḍa* ـەوە) ◊ انتفاضه

**intima** /ˈɪntɪmə/ *noun, pl.* intimae /-miː/
(توێکاری و گیانەوەرناسی) نێوەوەترین پەردە یا پەردەی هەرەنێوەوەی ڕەگ، خوێنبەر و هتد (intimal *adj*: سەربە intima: بنەڕەت: کورتەی *tunica intima* لاتین "innermost sheath") ◊ انتیما

**intimacy** /ˈɪntɪməsi/ *noun, pl.* intimacies
1 گەرم‌وگوڕی، دۆستایەتی، سەروسەخت، نزیکی، تێکەڵی، پێوەندی نزیک 2 هاوجێیی، نزیکی، پێوەندی سێکسی (زۆرتر بێ‌ژن‌ومێردایەتی) ◊ 1 صمیمیت، نزدیکی 2 رابطه‌ی نامشروع جنسی

**intimate** /ˈɪntɪmət/ *adjective, noun*
*adj* 1 گەرم‌وگوڕ، یەکماڵ، گیانی‌گیانی، نزیک، تێکەلاو، تێکەڵ، خۆشەویست 2 تایبەتی، خۆیی، پێرسۆناڵ، دۆستانە 3 پەروەردەکاری، قووڵ، دووروودرێژ، چڕوپڕ، ورد، تەواو 4 هەبوونی پێوەندی سێکسی، هەبوونی سەروساخت *n* دۆستی گیانی‌گیانی (intimately *adv*: 1 گەرم‌وگوڕانە 2 تایبەتانە، بە شێوەیەکی تایبەتی 3 بەتەواوەتی؛ intimateness *n*) ◊ *adj* 1 صمیمی 2 خصوصی، شخصی، دوستانه 3 دقیق، کامل، مفصل، عمیق 4 دارای رابطه‌ی جنسی *n* دوست صمیمی

**intimation** /ˌɪntɪˈmeɪʃn/ *noun*
ئاماژە، مێزە، تێگەیاندن، بەگوێ‌دادان، حاڵی‌کردن، ئاگایی، ئاگادارکردنەوە، دانەزانین، پێ‌وتن، ڕاگەیاندن ◊ اشاره، ایما، تلویح، فهماندن، خبر، اعلام

**intimidated** /ɪnˈtɪmɪdeɪtɪd/ *adjective*
ترساو، تۆقیو، ترس‌لێ‌نیشتوو، هەراسان، نگەران ◊ وحشت‌زده

**intimidating** /ɪnˈtɪmɪdeɪtɪŋ/ *adjective*
ترسناک، تۆقێنەر، نگەرانکەر: *an intimidating manner* This kind of ◊

*questioning can be very intimidating to children* (intimidatingly /ɪn'tɪmɪdeɪtɪŋli/ *adv*) ◌ وحشتناک

**intimidation** /ɪnˌtɪmɪ'deɪʃn/ *noun*
ترساندن، تۆقاندن، هەڕەشە(لێ کردن)، گەف، چاوترسێن کردن (intimidator *n*: هەڕەشەلێکەر، ترسێنەر، تۆقێنەر) ◌ ارعاب، تهدید

**intimidatory** /ɪnˌtɪmɪ'deɪtəri/ *adjective*
هەڕەشەیی یانە، هەڕەشەلێکەرانە، ترسێنەرانە ◌ تهدیدآمیز

**intinction** /ɪn'tɪŋ(k)ʃ(ə)n/ *noun*
ڕەنگ ڕێژی ◌ رنگ‌رزی

**intine** *noun*
ئینتین: بەرگی نێوەوەی سپۆری، وەک هی دەنگی هەلالە ◌ درونه‌پوش

**into** /'ɪntə, US 'ɪntu:/ *preposition*
لەنێو، ناو، بۆ ناو، بۆ نێو، تێ، پێوە، بۆ، بە: *Speak clearly into the microphone* ◊ *Come into the house* ◊ *an inquiry into safety procedures* ◊ *She was sliding into depression* ◌ توی، به، در

**intolerable** /ɪn'tɒlərəbl, US -'tɑ:l-/ *adjective*
دەرنەبردوو، خوێنەگرتوو، بەرگەنەگرتوو، تاقەتنەهێنەر، لەخۆگرتن نەهاتوو، (لێ)هەڵنەکردوو، (لەگەڵی) هەڵناکری، دەرنابری، لە تاقەت بەدەر، سەخت، قورس، دژوار، (زۆر) ناخۆش (intolerableness /ɪn'tɒlərəblnəs, US -'tɑ:l-/ *n*: دەرنەبردوویی، خوێنەگرتوویی، بەرگەنەگرتوویی، سەختی، دژواری، تاقەتنەهێنان، لەخۆگرتن نەهاتوویی، قورسی؛ intolerably /-əbli/ *adv*: دەرنەبردووانە) ◌ تحمل‌ناپذیر

**intolerance** /-əns/ *noun*
1 ناسنگ‌فراوانی، ناپشوودرێژی، دەرنەبردن، هەڵنەکردن، بەرگەنەگرتن، تاقەتنەهێنان: *an intolerance to dairy products* ◊ *religious intolerance* 2 ژێربارنەچوون، قایل‌نەبوون 3 بیرتەسکی، دەمارگرژی ◌ 1 نابردباری، ناشکیبایی، عدم تحمل 2 عدم قبول 3 کوته‌فکری

**intolerant** /ɪn'tɒlərənt, US -'tɑ:l-/ *adjective*
1 ناسنگ‌فراوان، ناپشوودرێژ، پشووکورت، پشووتەنگ، دەرنەبردوو، هەڵنەکردوو، ژێربارنەچوو، قەبووڵنەکردوو، مل‌دانەنەواندوو، قایل‌نەبوو 2 بیرتەسک، بیرتەنگ، بەرچاوتەنگ، دەمارگرژ (intolerantness /-ɒlərəntnəs, US -'tɑ:l-/ *n*) ◌ 1 نابردبار، کم‌تحمل 2 کوته‌فکر، متعصب

**intolerantly** /ɪn'tɒlərəntli, US -'tɑ:l-/ *adverb*
بیرتەسکانە ◌ کوته‌فکرانه

**intonation** /ˌɪntə'neɪʃn/ *noun*
(دەنگناسی) ئاواز، زۆر و کەم‌بوون یان بەرز و نزمی تریەی دەنگ لە کاتی قسەکردندا: *intonation patterns* ◌ آهنگ، انتوناسیون

**intorsion** /ɪn'tɔ:ʃn/ *noun*, also intortion
ئالان، بادران، باهەڵدران، قەف‌خواردن، پێچ‌دران ◌ پیچیدگی

**in toto** /ˌɪn 'təʊtəʊ, US 'toʊtoʊ/ *adverb*
بە تەواوەتی، یەکجاری، پێکەوە، سەرجەم، هەموو بەشەکان دەگرێتەوە، completely: *The proposal was accepted in toto* ◌ کاملاً، یکجا

**intoxicant** /ɪn'tɒksɪkənt, US -'tɑ:k-/ *adjective*
مەست‌کەر، مەستی‌هێنەر (ب.ت. خواردنەوەی ئەلکولی) ◌ مستی‌آور

**intoxicated** /ɪn'tɒksɪkeɪtɪd, US -'tɑ:k-/ *adjective*
مەست، لاکەوتە، کەیل، شاگەشکە، هەژیو، وروژاو، سەرخۆش: *intoxicated with success* ◌ مست، به وجدآمده

**intoxicating** /ɪn'tɒksɪkeɪtɪŋ, US -'tɑ:k-/ *adjective*
1 مەست‌کەر، مەستێنەر 2 سەرخۆش‌کەر، هەژێنەر، خۆش، خۆشی‌هێنەر، وروژێنەر ◌ 1 مستی‌آور 2 به وجدآورنده

**intoxication** /ɪnˌtɒksɪ'keɪʃn, US -ˌtɑ:k-/ *noun*
1 ژاراویبوون 2 مەستی، کەیلی، سەرمەستی، سەرخۆشی، شاگەشکەیی، لەخۆبوونەوە ◌ 1 مسمومیت 2 مستی، وجد

**intra-** /'ɪntrə/ *prefix*
پێشگر: نێوەوە، ژوورەوە، لەنێو، نێو، ناو: *intra-departmental* *intravenous* (بنەڕەت: لە *intra* لاتینەوە "inside") ◌ پیشوند: درون، داخل، توی

**intracellular** *adjective*
(زیندەناسی) لە نێو خانە یا خانەکاندا روودەدا (یا هەڵکەوتوو)، ژوورخانەیی: *intercellular parasites* ◌ (intracellularly *adv*) انتراسلیولار

**intracranial** /ˌɪntræ'kreɪnɪəl/ *adjective*
لە نێوەوەی کەڕاکە یان کاسەی سەردا، ژوورکەڕاکەیی ◌ درون جمجمه

**intractability** /ɪnˌtræktə'bɪləti/ *noun*, also intractableness
1 سەرڕێژیوی، کەللەڕەقی، سەرسەختی، لاریی، هەتەری 2 هەڵەتی، دژواری، سەختی ◌ 1 سرکشی، خیره‌سری 2 سختی

**intractable** /ɪn'træktəbl/ *adjective*
1 سەرڕێژیو، کەللەڕەق، لاسار، لا، سەرسەخت،

هەتـەر، ناحاڵـی 2 هەڵـەت، دژوار، سـەخت، چـەتوون، ئاسـتەنگ، ئاسـتەم، چارەسـەرنەکراو (*adv* intractably: لاسارانە، سەربزێوانە) ◌ 1 سرکش، خیرەسر 2 بغرنج، سخت

**intrados** /ɪnˈtreɪdɒs/ *noun, pl.* same or intradoses

کەوانـەی نێـوەوە یـان بنـەوەی تاقـێ (بڕوانـە extrados) ◌ درونسو

**intramolecular** *adjective*

ژوورگـــــــەردی، ژوورمۆلۆکـــــــولی (*adv* intramolecularly) ◌ درونمولکولی

**intramural** /ˌɪntrəˈmjʊərəl, US -ˈmjʊrəl/ *adjective*

1 کراو یان هەڵکەوتوو لە نێو خانووبەرەیێ 2 (زیندەناسی و پزشکی) هەڵکەوتوو لە نێو ئەندامێکی بۆشی یان خانەیێ 3 نێوخۆیی 4 ژوور یان نێوخوێندنگایی ◌ 1 و 2 انترامولار 3 داخلی 4 درونمدرسەای

**intramuscular** /ˌɪntrəˈmʌskjələ(r)/ *adjective*

نێوماسوولکەیی، لەنێو ماسوولکەدا (*adv* -uscularly) ◌ داخل عضلەای

**intransigence** /-əns/ *noun*

کەللـەڕەقی، سەرسـەختی، لایـی، لاسـاری، ڕێکنەکەوتوویی، نەسازاوی ◌ سازشناپذیری

**intransigent** /ɪnˈtrænsɪdʒənt, US -ˈtrænz-/ *adjective, noun*

*adj* کەللەرەق، سەرسەخت، لا، ڕێکنەکەوتوو لاسار، نەسازاو: *n an -gent attitude* کەسێکی لاسـار (*adv* intransigently: کەللەڕەقانـە) ◌ *adj* سازشناپذیر *n* آدم سازشناپذیر

**intransitive** /ɪnˈtrænsətɪv/ *adjective, noun*

*adj* (ڕێزمـان) تێنەپـەڕ، دەربازنـەبوویی، بـەبێ بەرکاری ڕاستەوخۆ direct object بەکاردێترێ: *The verb 'die' as in 'He died suddenly', is intransitive n* کـاری تێنەپـەڕ (دژی *n* transitive؛ *n* intransitivity) ◌ *adj* لازم *n* فعل لازم

**intransitive verb** *noun*

(ڕێزمان) کاری تێنەپەڕ ◌ فعل لازم

**intransitively** /ɪnˈtrænsətɪvli/ *adverb*

تێنەپەڕانە، بە شێوەیەکی تێنەپەڕ: *The verb is being used intransitively* ◌ به طور لازم

**intrant** /ˈɪntrənt/ *adjective*

ژوورەوەهاتوو، نێوەوەهاتوو ◌ واردشونده

**intrapersonal** *adjective*

ئینتراپێرسۆنال ◌ درونفردی

**intrastate** *adjective*

لەنێو ئەیالەتێ، لەنێو هەرێمێ (ب.ت. ئەمریکا)، نێوئەیالەتی، نێوهەرێمی ◌ درونایالتی

**intra-uterine** /ˌɪntrəˈjuːtəraɪn/ *adjective,* also intrauterine

نێومناڵـدانی، لـە ژوور یـان نێـو مناڵـداندا ◌ درونرحمی

**intra-uterine device** *noun; abbreviation* IUD

ئای‌یودی (دەزگا بۆ سکپڕنەبوون) ◌ آی‌یودی

**intravascular** /ˌɪntrəˈvæskjʊlə/ *adjective*

ژووررەگی، هەڵکەوتوو لە نێوەوەی دەزگـای ڕەگـی یـان نـاوخۆرەوە: *intravascular an intravascular injection ◊ thrombosis* (*adv* -ascularly) ◌ درونعروقی، درونآوندی

**intravenous** /ˌɪntrəˈviːnəs/ *adjective; abbreviation* IV

لەنێوەوەی ڕەگ، لە نێوەوەی خوێنهێنەر(دا)، نێـوڕەگـی: *intravenous fluids ◊ an intravenous injection* (*adv* intravenously: *drugs injected intravenously ◊ to feed sb intravenously*) ◌ درونوریدی

**in tray** *noun*

جێگای نامە گەیشتووەکان ◌ انترای

**intrazonal** *adjective*

نێوناوچەیی: سەربە ئەو خاک یان گڵ یان کۆمـەڵـە خـاکێکی سـەرەکـی کـە خـاوەنی تایبەتمەندی (تا ڕادەیێ) باش‌پەرەسەندوویی‌یە و (زۆرتـر) لـە بنـەڕەتـا لـە لایـەن هۆکـارە خۆجێیی‌یەکانەوە local factors دیاری دەکرێ (وەک ماک و بەردی دایکی) هەتا ئاووهەوا و گژوگیا؛ تایبەتمەندی ئەو خاکانەیە کە لەوان‌دا شوێنەواری بەردی دایکی هەیە (بڕوانە azonal و zonal) ◌ درونمنطقەای، انترازونال

**intrenchment** = entrenchment

**intrepid** /ɪnˈtrepɪd/ *adjective*

بـێبـاک، نـەترس، بەجـەرگ، نـەبـەرد، ئـازا، چاونـەتـرس (*n* intrepidity /ˌɪntrɪˈpɪdɪti/: بێباکی، نەترسی، نەبەردی، بەجەرگی، ئازایەتی، چاونەترسی؛ *adv* intrepidly: نەترسـانە، بێباکانە، ئازایانە، چاونەترسانە) ◌ بی‌باک، متهور، جسور

**intricacy** /ˈɪntrɪkəsi/ *noun, pl.* intricacies

1 پێچـــەڵاوپێچی، ئاڵـــۆزبوون، ســـەختی، دیـــدیوبـــۆدی 2 (intricacies) شـــتە پێچەڵاوپێچەکان، شتە ئاڵۆزەکان، وردەکاری: *the intricacies of economic policy* ◌ 1 پیچیدگی 2 (در جمع) چیزهای پیچیده، جزئیات

**intricate** /ˈɪntrɪkət/ *adjective*

1 پێچەڵاوپێچ، ئاڵۆز، تێکئاڵاو؟، تێکچنراو، ورد: *complicated ◊ an intrite machinery* 2 *intricate patterns ◊ intricate plot* سەخت، گران، دژوار (بۆ چارەسەرکردن یان شیکردنەوە): *an intricate network of loyalties and relationships* (گرێ‌کوێرە intricate knot؛ intricateness

/'ɪntrɪkətnəs/ n) ◯ 1 پیچیده 2 بغرنج، مشکل
**intricately** /'ɪntrɪkətli/ *adverb*
1 بــه شــێوەیەکی ئاڵــۆز، پێچەڵاوپێچانــە 2 وەستایانە، شارەزایانە، بە وردی، ورد، ناسکانە: *-ricately carved* ◯ 1 به طور پیچیده 2 ماهرانه
**intrigant** /'ɪntrɪg(ə)nt/ *noun*, also intriguant
پیلانگێر، پیلانباز ◯ توطئه‌گر
**intrigue** /'ɪntri:g, US ɪn'tri:g/ *noun*
1 پــیلان، داونانــەوە، فــێڵ‌وتەڵــەکە، ســازوباز، کــەین‌وبــەین، نەخــشــە 2 پێوەنــدی لەبنــەوە یــان نهێنی ◯ 1 توطئه، دسیسه 2 رابطه‌ی نهانی
**intriguer** *noun*, also intrigant
پیلانگێر، داونەرەوە، بەسازوباز ◯ توطئه‌گر
**intriguing** /ɪn'tri:gɪŋ/ *adjective*
خــۆش، ســەرنج‌ڕاکــێش، تەڵــەسماوی، ســەیر :intriguingly /ɪn'tri:gɪŋli/ *adv*) بــە شێوەیەکی خۆش، سەرنج‌ڕاکێشانە) ◯ جذاب، حیرت‌انگیز
**intrinsic** /ɪn'trɪnsɪk, US -zɪk/ *adjective*
خۆمــاکی، زاتی، خــۆیی، خۆرســکی، نێــوەکی، ڕاســتەقینە، گەوهــەری، سروشــتی، essential: *These* ◊ *the intrinsic value of education tasks were repetitive, lengthy and the* ◊ *lacking any intrinsic interest* intrinsically /-) *intrinsic worth of a gem* kli/ *adv*: بە شێوەیەکی خۆماکی یان زاتی، خۆی لە خۆی‌دا) ◯ ذاتی، داخلی، حقیقی، طبیعی
**intrinsic factor** *noun*
هۆکــاری نێــوەکــی: جــۆرێ glycoprotein مێنــەدەیــی کــە کــارەکــەی مــژین و گــرتنی absorption ڤیتامین $B_{12}$ یە ◯ عامل درونی
**intro** /'ɪntrəʊ, US 'ɪntroʊ/, *pl.* intros, *abbreviation* introduction
(موسیقا) پێشەکی ◯ مقدمه
**intro-** *prefix*
پێشگر: 1 لەنێو، ناو، بۆ ناو، تێ، پێوە، بۆ، بە 2 بــەرەو نێــوەوە، ڕوو لــە ژوورەوە (بنــەڕەت: لــە *intro* لاتینەوە) ◯ پیشوند: 1 توی، به، در 2 به سوی داخل
**introduction** /ˌɪntrə'dʌkʃn/ *noun*
*Introductions were made and* :1 ناسـاندن *2 the conversation started to flow* خــستەڕوو، پیــشاندان، ناەبــەرچاو، دارشــتن، هێنانــەئارا، هێنانــەگۆڕێ، دامــەزراندن: *the introduction of new manufacturing the -ion of compulsory* ◊ *methods* 3 بلاوکردنــەوە، کردنــەباو، *military service* برەوپێدان 4 یەکەمین ئەزموون: *This album was my first introduction to modern jazz* 5 پێشەکی، دەسپێک، بەرایی: *'An -roduction It's a useful* ◊ *to Astronomy' introduction to an extremely complex* 6 *a brief introduction* ◊ *subject* چوونــەنێوەوە، چوونــەژوورەوە، خــستەنێو، تێخــستن، تــێ‌ترنجانــدن، تێنــان 7 (موسیقا) پێشەکی: 1 ◯ *an eight-bar introduction* معرفی 2 ارائه، طرح 3 ترویج 4 نخستین تجربه 5 مقدمه 6 دخول. داخل‌سازی 7 مقدمه
**introductory** /ˌɪntrə'dʌktəri/ *adjective*
ئامادەیی، سەرەتایی، وەکوو پێشەکی: *an* ◊ *introductory course in calculus* ◊ *introductory paragraphs/remarks* ◯ *introductory chapters* مقدماتی
**introflexion** *noun*
بۆ نێوە چەمانەوە، نێوەچەمانەوە، بۆ نێوە نووشتانەوە ◯ درون‌خمیدگی
**introgression** /ˌɪntrə(ʊ)'grɛʃ(ə)n/ *noun*
(زیندەناسی) تێخستن، خستەنێو، تێچوون، تێخــراوی، تێبــراوی، تێچــوویی ◯ ادخــال، داخل‌شدگی
**introit** /'ɪntrɔɪt, US ɪn'trəʊɪt/ *noun*
چوونەژوورەوە، چوونەنێوەوە ◯ دخول، ورود
**intromission** /ˌɪntrə'mɪʃn/ *noun*
تێخستن، تێبرین، تێنان، پیاکردن، ب.ت. تێخستنی یان ئەو ماوە و سەروبەندە کە دەزگای پیاو لە شەرمی ژن دایە ◯ ادخال، توگذاری
**introrse** /ɪn'trɔ:s/ *adjective*
(ڕووەکناسی و گیانەوەرناسی) ڕوولە نێوەوە کردوو، وەرسووڕاو بەرەو نێوەوە یان تەوەر، تەوەرسووڕ (دژی extrorse) ◯ متوجه درون
**introspection** /ˌɪntrə'spekʃn/ *noun*
*These situations are best* :بەخۆداچوونەوە *resolved with the minimum of -n or self-analysis* (-rospectional *adj*) ◯ درون‌نگری
**introspective** /ˌɪntrə'spektɪv/ *adjective*
*There were* :بەخۆداچوو(ەوە)، بەخۆداچووانە *a lot of family problems and Jim became an* ◊ *increasingly introspective introspective piece of writing* :introspectively /ˌɪntrə'spektɪvli/ *adv*) ◯ (introspectiveness *n*: بەخۆداچووانە درون‌نگر، درون‌نگرانه
**introversion** /ˌɪntrə'vɜ:ʃn, US -'vɜ:rʒn/ *noun*
حەزبــەخۆکردن، ئینتروڤێرشــن، خۆگــەری، دەروونگەری: *Some people claim that an individual's degree of extroversion or* ◯ *introversion is inherited* درون‌گرایی
**introvert** /'ɪntrəvɜ:t, US -vɜ:rt/ *noun*
خۆگــەر، دەروونگــەر، حەزبەخۆکــەر، دوورەپــەرێز، حەزبــەخۆکردوو: *He was*

*a reserved man who ◊ described as an -t spoke little* ۞ درون‌گرا

**introverted** /ˈɪntrəvɜːtɪd, US -vɜːrt-/ *adjective*

خۆگەرانە، دەروون‌گەرانە، حەزبەخۆکردووانە: *She was as naturally extroverted as Paul* ◊ *His teachers was painfully introverted* ۞ *perceived him as shy and introverted* درون‌گرایانە

**intruder** /ɪnˈtruːdə(r)/ *noun*

1 خۆپیاکردوو (بەبێ دەستوور)، مزاحیم، ئاوەکی، خۆداکوتەرە، خۆتێهەڵقورتێن، دزدوک 2 دز، چەتە ۞ 1 مزاحم، فضول 2 دزد

**intrusion** /ɪnˈtruːʒn/ *noun*

1 خۆپیاکردن، خۆداکوتاندن، مزاحیمی، خۆتێهەڵقورتاندن 2 دەس‌درێژی، زیدەگافی 3 چوونەنێوی بە زۆری یان زۆرەملێ forcible entry (خۆپیاکردن) بەردە تواوەکان یان ماگما بۆ نێو یان نێوان چین‌بەندی‌یەکانی formation (تەختە) بەردەکان؛ هەروەها تواوەکەی تێوەچوو ۞ 1 مزاحمت، فضولی 2 تجاوز 3 انتروسیون

**intrusive** /ɪnˈtruːsɪv/ *adjective*

1 (بە زۆر) خۆپیاکردوو، مزاحیم، خۆداکوتەرە، خۆتێهەڵقورتێن 2 (دەنگ‌ناسی) سەرخستە، زیادکراو: لە نێوان وشە یان برگەکاندا دەخرێتەسەر تا گۆیان ئاسان‌تر کاتەوە، ب.ن. r لە *law and order* یا لە *saw a film* (= ئەم "r" بەشێ لە ئینگلیسی ستاندارد یا پێوەر نییە) 3 دەس‌درێژکەر 3 (زەوی‌ناسی) تێوەچوو یان دزەکردوو بە شێوەی تواوە لەنێو کون و بۆشی تەختەبەردەکاندا (هی ئاگرپژێن؛ intrusively *adv* /ɪnˈtruːsɪvli/: خۆتێهەڵقورتێنانە؛ intrusiveness *n* /ɪnˈtruːsɪvnəs/: خۆتێهەڵقورتاندن، خۆپیاکردن، خۆداکوتاندن) ۞ 1 مزاحم، فضول 2 (آواشناسی) افزوده، اضافی 3 متجاوز 4 انتروسیو، نفوذی

**intuition** /ˌɪntjuˈɪʃn, US -tu-/ *noun*

1 دیناو، شهود 2 تێگەیشتنی راستەوخۆ، پێزانینی کتوپڕ، زیرەکی، ژیری 3 پێ‌وابوون، گومان، مەزندە ۞ 1 شهود 2 شم، فراست 3 حدس

**intuitional** /ˌɪntjuˈɪʃənl, US -tu-/ *adjective*

دیناوی، شهودی، سەربە تێگەیشتنی راستەوخۆ ۞ شهودی

**intuitionalism** *noun*

شهودگەری (دیناوگەری؟، دیناوباوەڕی؟) ۞ شهوگرایی

**intuitionalist** *noun*

شهودگەر (دیناوگەر، دیناوباوەڕ) ۞ شهودگرا

**intuitionism** *noun*

شهودگەری (دیناوگەری، دیناوباوەڕی) ۞ شهودگرایی

**intuitionist** *noun, adjective*

*n* شهودگەر، (دیناوگەر، دیناوباوەڕ) *adj* شهودگەری‌یانە ۞ *n* شهودگرا *adj* شهودگرایانە

**intuitive** /ɪnˈtjuːɪtɪv, US -ˈtuː-/ *adjective*

1 مەزندەیی، لە رووی گومانەوە، پێوابووانە 2 راستەوخۆتێگەیشتوو، دیناوی، ژیرانە: *had an intuitive awareness of his sister's feelings* 3 نابەڵگەهێنانەوەیی، هەستی (-tively *adv* /ɪnˈtjuːɪtɪvli, US -ˈtuː-/: 1 پێوابووانە، لە رووی گومانەوە، بە شێوەیەکی مەزندەیی 2 بە شێوەیەکی دیناو، دیناوانە، شهودی‌یانە، راستەوخۆتێگەیشتووانە؛ intuitiveness *n*) ۞ 1 حدسی 2 شهودی 3 غیراستدلالی

**intumescence** /ˌɪntjʊˈmesəns/ *noun*

ماسین، باکردن، پەنەمیان، ئەستووربوون ۞ ورم، آماس

**intumescent** /ˌɪntjʊˈmesənt/ *adjective*

ماسیو، ئەستووربوو، باکردوو، پەنەمیاو (intumescence *n*: ماسین، باکردن، ماس، پەنەمیان، ئەستووربوون) ۞ ورم‌کردە، آماس‌کردە

**intussusception** /ˌɪntəsəˈsepʃ(ə)n/ *noun*

1 (پزشکی) پێچ‌کەوتن، خزین یان هەڵگەڕانەوەی invagination بەشێکی ریخۆڵە بۆ نێو بە شێکی تر 2 توانەوەی assimilation ماکێکی نوێ و بڵاوبوونەوەی dispersal بە (نێو) ماک و مەتریاڵێکی هەبوودا preexistent matter (intussusceptive *adj*) ۞ درخودگیری

**Inuit** /ˈɪnjuɪt, US ˈɪnuɪt/ *adjective, noun,* also Innuit

*adj* ئیسکیمویی *n* 1 ئیسکیمو، زمان یان زمانە ئیسکیمویی‌یەکان 2 خەڵکی رەسەنی باکووری کەنەدا و چەند بەشێ لە گرینلەند Greenland و ئالاسکا Alaska ۞ *adj* اسکیمویی *n* 1 اسکیمو، زبان یا زبان‌های اسکیمویی 2 اسکیمویی

**Inuk** /ˈɪnʊk/ *noun, pl.* Inuit

تەندامێکی گەلی Inuit (بنەڕەت: ئیسکیمویی، واتا "کەس") ۞ عضو مردم اسکیمو

**Inuktitut** / ɪˈnʊktɪtʊt/ *noun,* also Inuktituk /-tʊk/

زمانی گەلی ئینوئیت یان ئیسکیمو(یی) ۞ زبان مردم اسکیمو

**inulase** *noun*

(زیندەکیمیا) هەوێنەیێ کە ئینسولین دەگۆڕێ بۆ levulose ۞ اینولاز

**inulin** /ˈɪnjʊlɪn/ *noun*

(زیندەکیمیا) ئینولین: ماکێ کە لە فرۆکتۆز دەگیرێ، لە رەگی چەندین جۆر گیا و رووەکدا هەیە، پۆلی‌ساکاریدێکی نشاستەئاسا $(C_6H_{10}O_5)_n$ ۞ اینولین

**inunction** /ɪˈnʌŋkʃn/ *noun*

(پزشکی) چەورکردن ◌ روغن‌مالی

**inundation** /ˌɪnʌnˈdeɪʃn/ *noun*

1 لافاوگرتن، کەوتنەژێرئاو، بوون بە ژێر ئاوەوە، ئاوداگرتن 2 (خوازە) لافاو، شالاو ◌ 1 سیل‌گرفتگی، طغیان آب 2 (مجازی) سیل

**Inupiaq** /ɪˈnuːpɪak/ *noun, adjective*, also Inupiat /-pɪat/, Inupik /-pɪk/

*n* 1 ئەندامی گەلێکی ئیسکیمۆیی، دانیشتووی باکووری ئەلاسکا 2 زمانی Inuit *adj* سەر بە ئەو گەلە یان زمانەکەیان (بنەڕەت: ئیسکیمۆیی، لە *inuk* "کەس" + *piaq* "ڕاست، ڕەسەن "genuine") ◌ اینوپیاک

**inurbane** /ˌɪnɜːˈbeɪn/ *adjective*

بێ‌ڕەوشت، بێ‌ئەدەب ( inurbanity /ˌɪnɜːˈbænɪtɪ/ *n*) ◌ بی‌ادب

**inured** *adjective*

فێربوو، خووگرتوو، ڕاهاتوو، عادەت‌کردوو ◌ عادت‌کرده

**inurement** *noun*

فێربوون، خووگرتن، ڕاهاتن ◌ اعتیاد

**inustion** *noun*

داخ‌کردن، سووتاندن، پیاچزاندن ◌ عمل سوزاندن

**in utero** /ɪn ˈjuːtərəʊ/ *adverb, adjective*

(لاتین) لە منداڵدانی ژنا، بەرلە دایک‌بوون ◌ در رحم، قبل از تولد

**in vacuo** /ɪn ˈvakjʊəʊ/ *adverb*

(لاتین) لە بۆشاییدا ◌ در خلاء

**inutile** /ˌɪnˈjuːtɪl/ *adjective*

بێ‌سوود، بێهوودە، بێ‌بەهرە، بێ‌قازانج، useless، unusable ◌ بی‌فایده

**inutility** /ˌɪnjuːˈtɪlɪtɪ/ *noun, pl.* inutilities

بێ‌سوودی، بێهوودەیی، بێ‌بەهرەیی، بێ‌قازانجی ◌ بی‌فایدگی

**invader** /ɪnˈveɪdə(r)/ *noun*

هێرشکەر، دەس‌درێژکەر، داگیرکەر: *a foreign invader* ◊ *They prepared to repel the invaders* ◌ مهاجم، متجاوز

**invagination** /ɪnˌvædʒəˈneɪʃn/ *noun*

هەڵگەڕانەوە بۆ نێوەوە، پێچ‌کەوتنی ڕیخۆڵە ◌ توی خود برگشتن

**invalid**[1] /ɪnˈvælɪd/ *adjective*

باوەڕپێنەکراو، بێ‌باوەڕ، بێ‌بایەخ، بێ‌نرخ، درۆ، نادروست، بێ‌بڕەو، بەکارنەهاتوو، بێکارە، پەسندنەکراو، هەڵوەشاو، بەتاڵەوەبوو، بێ‌بنچینە، پووچەڵ: *an -d assumption* ◊ *declared the will invalid* ◊ *an invalid argument* ◊ *The treaty was declared invalid because it had not been ratified* (invalidly *adv*) ◌ بی‌اعتبار، نامعتبر، بی‌ارزش، باطل

**invalid**[2] /ˈɪnvəlɪd/ *adjective, noun*

*adj* 1 نەخۆش، ناساز، دەردەدار، زەلیل، کەفتەکار، جێ‌کەوتە، ئارەفتە: *his -lid wife* ◊ *She had been a delicate child and her parents had treated her as an -d* 2 بێ‌هێز، بێ‌گیان، بێ‌ڕەگ *n* مرۆ یان کەسێکی نەخۆش ◌ *adj* 1 بیمار، علیل، زمین‌گیر 2 بی‌قوت *n* شخص بیمار

**invalidation** /ɪnˌvælɪˈdeɪʃn/ *noun*

هەڵوەشاندن، پووچەڵ‌کردن، بەتاڵ‌کردنەوە، بێ‌باوەڕاندن، پووچ‌کردنەوە، پووچاندن، لەبڕەوخستن، بێ‌بایەخ‌کردن ◌ ابطال، ازاعتبارانداختن

**invalidism** *noun*

جێکەوتەیی، نەخۆشی درێژخایەن، زەلیلی، پەککەوتوویی ◌ زمین‌گیری

**invalidity** /ˌɪnvəˈlɪdətɪ/ *noun*

1 باوەڕپێنەکراوی، بێ‌باوەڕی، پووچەڵی، هەڵوەشاوەیی، بێ‌بنچینەیی، بێ‌بایەخی، بێ‌بڕەوی 2 لەکارکەوتوویی، پەککەوتوویی، نەخۆشی، زەلیلی ◌ 1 بی‌اعتباری، بطلان، عدم اعتبار 2 علیلی

**invaluable** /ɪnˈvæljuəbl/ *adjective*

بەبایەخ، بەنرخ، گرانبایی، پربەها، بەپوێتە، نرخ بۆ دیاری‌نەکراو ◌ ارزشمند، ذی‌قیمت

**invariability** /ɪnˌveəriəˈbɪlətɪ, US -ˌver-/ *noun*, also invariance

لەگۆڕاننەهاتوویی، نەگۆڕی، هەرئەوەیی ◌ تغییرناپذیری

**invariable** /ɪnˈveəriəbl, US -ˈver-/ *adjective, noun*

*adj* لەگۆڕاننەهاتوو، نەگۆڕ، ناگۆڕێ، هەرئەوە، چەسپیو، جێگیر، هەمیشەیی: *Her routine was invariable* ◊ *an invariable principle* *n* بڕی نەگۆڕ یان لەگۆڕاننەهاتوو ( invariably /ɪnˈveəriəbli, US -ˈver-/ *adv*: هەمیشە، نەگۆڕانە) ◌ *adj* تغییرناپذیر، ثابت *n* مقدار نامتغیر

**invariant** /ɪnˈveəriənt, US -ˈver-/ *adjective*

لەگۆڕاننەهاتوو، نەگۆڕ، هەرئەوە ◌ تغییرناپذیر

**invasion** /ɪnˈveɪʒn/ *noun*

1 هێرش، پەلامار، دەس‌درێژی، داگیرکەری، تالان، ڕاوڕووت 2 دەرکەوتن، تەنینەوە، داکەوتن 3 شکاندن، بەزاندن، پێشێل‌کردن، سەرپێچی، قانوون‌بەزێنی ◌ 1 حمله، تجاوز، غارت 2 بروز 3 تعدی، نقض

**invasive** /ɪnˈveɪsɪv/ *adjective*

1 دەس‌درێژکەرانە، دەس‌درێژکەر، هێرش‌کەر، پەلاماردەر 2 پەلاماردەر، تەنەرەوە، داگیر، داشکانەوەی بۆ تەنینەوە هەیە، ب.ت. دادەشکێتەوە بۆ پەلاماردانی شانەیێکی ساغ 3 *invasive cancer cells* :healthy tissue داشکانەوەی بەرەو شکاندنی قانوون هەیە

1 ◌ (invasiveness /ɪn'veɪsɪvnəs/ *n*) تجاوزگرانە، تجاوزگر، مهاجم 2 و 3 اینواسیو، مهاجم

**inective** /ɪn'vektɪv/ *noun*, also invection /ɪn'vekʃn/
جنێــو، ســخێف، ناونیتکــە، تانــە، تەشــەر، ســووکایەتی، پــرجنێوکردن، ئابــرووبردن، شرتوشۆدەرهێنان ◌ فحش، ناسزا، طعنە، توهین

**inveiglement** *noun*
تــەفرەدان، لــە خــشتەبردن، هەڵــفریواندن، خەڵەتاندن، فریودان، خاپاندن، لە ڕێدەرکردن ◌ اغوا، فریفتگی

**inveigler** *noun*
تەفرەدەر، لەخشتەبەر، خەڵەتێنەر، فریودەر ◌ اغواگر

**inventible** /ɪn'ventəbl/ *adjective*
لەداهێنانهاتوو، دادێنری، دادەهێنری، شیاوی داهێنان ◌ اختراعپذیر

**invention** /ɪn'venʃn/ *noun*
1 داهێنان، سازکردن، دروستکردن، داهێنەرێتی 2 داستان یان چیرۆکی درۆ 3 درۆ 4 توانایی داهێنان یان داهێنەری ◌ 1 اختراع، ابداع، خلاقیت 2 داستان جعلی 3 کذب 4 قدرت ابتکار

**inventional** /ɪn'venʃənl/ *adjective*
داهێنەرانە، سەربە داهێنان ◌ اختراعی

**inventive** /ɪn'ventɪv/ *adjective*
داهێنــەر، دروســتکــەر، ســازکەر، داهێنەرانــە، *She has a highly inventive* :creative *This is a courageous and* ◊ *mind an* ◊ *inventive piece of film-making an -tive method* ◊ *inventive mind* :inventively /ɪn'ventɪvli/ *adv*) داهێنەرانە؛ *the* :inventiveness *n* داهێنان، داهێنەری: ◌ (*inventiveness of modern advertising* خلاق، مبتکر، ابتکارانه

**inventor** /ɪn'ventə(r)/ *noun*, also inventer
داهێنەر، سازکەر، دروستکەر ◌ مخترع، مبدع

**inventorial** /'ɪnvəntrɪəl, US -tɔ:rɪ/ *adjective*
لیستەیی، سەربە لیستە ◌ وابسته به صورت

**inventory** /'ɪnvəntrɪ, US -tɔ:rɪ/ *noun, pl.* inventories
*an inventory of the* :1 لیستە، پێرست *museum's contents* 2 گشت کەلوپەلی نێو *The inventory will be disposed of* :دووکان *inventory* ◊ *over the next twelve weeks* *control* ◌ 1 فهرست 2 موجودی مغازه

**inverse** /ˌɪn'vɜ:s, US ˌɪn'vɜ:rs/ *adjective, noun*
*adj* هەڵاوگێر، بەرقاژی، سەروبن، بەراوەژوو، *There is often an -verse* :ئاوەژوو، پێچەوانە *relationship between the power of the tool* (شتێ) 1 *n and how easy it is to use* پێچەوانە 2 (ماتماتیک) فانکشنی پێچەوانە یان ئاوەژوو ◌ *adj* وارونه، معکوس *n* 1 عکس 2 تابع معکوس

**inverse function** *noun*
فانکشنی پێچەوانە یان ئاوەژوو ◌ تابع وارون یا معکوس

**inverse element** *noun*
توخمی ئاوەژوو ◌ عنصر وارون

**inversely** /ˌɪn'vɜ:sli, US -'vɜ:rs-/ *adverb*
ئاوەژووانە، بە پێچەوانە، بە شێوەیەکی ئاوەژوو: *We regard health as inversely related to social class* ◌ به طور معکوس

**inverse proportion** *noun*, also inverse ratio
ڕێژەی پێچەوانە یان ئاوەژوو ◌ نسبت معکوس

**inversion** /ɪn'vɜ:ʃn, US ɪn'vɜ:rʃn, US -ʒn/ *noun*
1 ئــاوەژوویی، بــەراوەژوویی، هەڵاوگێــڕی، پێچەوانــەیی، ســـەروبنی، هەڵــگێڕانەوە، ســەرەونخونکــردن، پــشتەوروکردن، بــە پشتاخــستن، ســەروبنکــردن، هەڵــگەڕانەوە، هەڵگێڕانەوە 2 پێش و پاشخستن 3 (هەروەها sexual inversion) هاورەگــــەزبازی، 4 homosexuality زۆربوونی تێمپراچێری هەوا لە ئەنجامی زیادبوونی بەرزایی 5 گۆڕینی 6 alternating current تەزووی ڕاستەوخۆ بۆ گــۆڕینی ســۆکرۆزی dextrorotatory بــۆ تێکــەڵــەیێکــی levorotatoryی گلۆکــۆز و فرۆکتۆز 7 جۆرێ لادانی کرۆمۆزۆمی کە لەودا کەرتێکی کرۆمۆزۆم هەڵدەگەڕێتەوە یان ئاوەژوو دەبێتــەوە 8 = anastrophe ◌ 1 واژگــــونی، وارونگی، برعکس کردن، عکس، قلب 2 تقدیم و تأخیر 3 همجنسبازی 4، 5، 6، 7 و 8 انورسیون

**inversion centre** *noun*
ناوەندی بەراوەژوویی، چەقی ئاوەژوویی ◌ مرکز وارونگی

**invert**[1] /'ɪnvɔ:t/ *noun*
1 تاقی پێچەوانە، تاقی هەڵگەڕاوە، تاقی سەروبن 2 هاورەگەزباز ◌ 1 طاق وارونه 2 همجنسباز

**invert**[2] /'ɪnvɔ:t/ = invertebrate

**invertase** /'ɪnvɜ:teɪz, ɪn'vɜ:t-/ *noun*, also invertin or sucrase
هەوێنەیێ enzyme کە هانی هایدرۆلایسیسی سۆکرۆز دەدا ◌ اینورتاز

**invertebracy** /ɪn'vɜ:təbrəsɪ, US -'vɜ:rt-/ *noun*
بێبڕبڕەیی، بێمۆغەرەیی، بێمۆرەیی ◌ بی‌مهرگی

**invertebral** *adjective*
بــێبڕبــڕە، بــێبڕبڕاگــە، بــێمۆغــەرە، بــێتیرەگــە، بێمۆرە ◌ بی‌مهره

**invertebrate** /ɪn'vɜ:tɪbrət, US -'vɜ:rt-/ *adjective, noun*
*adj* 1 بێ‌بڕبڕە، بێ مووروەگەی پشت spinal column 2 لاواز، بێ‌دەسەلات، بێ‌غیرەت، هیچ‌لەدەس‌نەهاتوو، حیز *n* 1 گیانەوەری بێ‌بڕبڕە (vertebrate بڕوانە) 2 کەسێکی لاواز یان بێ‌دەسەلات ◌ *adj* 1 بی‌مهره 2 سست عنصر. *n* 1 جانور بی‌مهره 2 آدم سست عنصر

**inverted** *adjective*
پێچەوانە، ئاوەژوو، دەمەونخون، بەراوەژوو، سەروبن‌کراو، هەڵگەڕاوە، بەرقاژی ◌ وارونه، معکوس

**inverted commas** *noun,* also quotation mark
بۆراوەژوو، نیشانەی گێڕانەوە ("ـــ") ◌ گیومه

**inverted snobbery** *noun*
مرۆی خەڵک‌ناسایی، دژایەتی لەگەڵ چینی دەوڵەمەند (inverted snob *n*: مرۆی خەڵکی یا خەڵک‌ناسا، ئینفێرتید سنۆب) ◌ مردمی‌نمایی

**inverter** *noun*
هەڵگێڕەوە، سەروبن‌کەر، بەپشتاخەر ◌ برگرداننده

**invertibility** /ɪn,vɜ:tə'bɪləti/ *noun*
لەهەڵگێڕانەوەهاتوویی ◌ قابلیت قلب

**invertibile** /ɪn'vɜ:təbl/ *adjective*
لەهەڵگێڕانەوەهاتوو، هەڵدەگێڕدرێتەوە: *an invertible matrix* ◌ قابل قلب

**invert sugar** *noun*
شەکری پێچەوانە یان ئاوەژوو: تێکەڵەی گلوکۆز و فرۆکتۆز، بە هایدرۆلایسی سوکرۆز بەدەست دێ ◌ قند معکوس، انورت شوگار

**investigation** /ɪn,vestɪ'geɪʃn/ *noun*
لێکۆڵینەوە، لێ‌توێژینەوە، تاوان‌دۆزی، لێ‌توێژینەوە، بن‌گیری، بەدواداچوون، لێ‌پرسینەوە: *a criminal/murder/police investigation* ◊ *The police have completed their investigations into the accident* (investigational *adj*) ◌ تحقیق، بررسی، رسیدگی، پژوهش، بازجویی

**investigative** /ɪn'vestɪgətɪv, US -geɪtɪv/ *adjective*
لێکۆڵینەوەیی، لێ‌توێژەرانە: *The article was an excellent piece of -tive journalism* ◊ *The police have full investigatory powers* ◌ تحقیقی

**investigative new drug** *noun, abbreviation* IND
دەرمانێکی نەسەلێنمراو کە لە لایەن Food and Drug Administration پەسند کراوە، بۆ چارەسەری کلینیکی بەرکاردێتری ◌ نوعی دارو

**investigator** /ɪn'vestɪgeɪtə(r)/ *noun*
تاوان‌پرس، لێ‌پرسێنکار، بەدواداچوو، پشکێنەر، توێژەر، لێکۆڵەر، تاوان‌دۆز ◌ بازجو، محقق، پژوهنده، رسیدگی کننده

**investigatory** /ɪn'vestɪgətəri, US -gətɔ:ri/ *adjective*
توێژینەوەیی، لێکۆڵینەوەیی، تاوان‌پرسانە، پشکێنەرانە، لێ‌پرسینەوانە ◌ پژوهشی، تحقیقی، بازجویانه

**investiture** /ɪn'vestɪtʃə(r)/ *noun*
1 ڕێ‌ورەسمی پێ‌سپاردن یان پێدان (پلەوپایە، سەرناو و هتد) 2 دیاری‌کردن 3 بەرگ ◌ 1 مراسم اعطا 2 تعیین 3 لباس

**investment** /ɪn'vestmənt/ *noun*
1 سەرمایەنانەوە، وەبەرهێنان، سەرمایەپێکەوەنان: *to encourage foreign investment* ◊ *investment income* 2 بەکارهێنان، چواندن 3 گەمارۆ، ئابلۆقە، دۆردان ◌ 1 سرمایه‌گذاری 2 بهره‌برداری 3 محاصره

**investment bank** *noun*
بانکی سەرمایەنانەوە یان وەبەرهێنان (investment banker *n*؛ investment banking *n*) ◌ بانک سرمایه‌گذاری

**investment company** *noun,* also investment trust
کۆمپانی سەرمایەنانەوە یان وەبەرهێنان ◌ شرکت سرمایه‌گذاری

**investor** /ɪn'vestə(r)/ *noun*
سەرمایەنەرەوە، وەبەرهێن، وەبەرهێنەر ◌ سرمایه‌گذار

**inveteracy** /ɪn'vetərəsi/ *noun*
لەمێژینەیی، بەپێشینەیی، درێژخایەنی، خووگرتوویی، لەگەڵ‌بوویی، ڕەگ‌داکوتاوی، بنج‌بەستوویی، tenacity ◌ دیرینگی، ریشه‌داری

**inveterate** /ɪn'vetərət/ *adjective*
1 کۆن، لەمێژینە، لەگەڵ‌بوو، بەپێشینەیی، دێرین، درێژخایەن، دوورودرێژ، خووگرتوو، گیرۆدە، ڕیشەداکوتاو، بنج‌داکوتاو، بنج‌بەستوو 2 کۆنەکار، کوڵیو (inveterateness *n*) ◌ 1 قدیمی، مزمن، ریشه‌دار 2 معتاد، قهار

**inveterately** /ɪn'vetərətli/ *adverb*
ڕەگ‌داکوتاوانە، بە شێوەیێکی ڕەگ‌داکوتاو ◌ به طور ریشه‌دار

**inviable** *adjective*
نەژیو: (زیندەوەری) ناتوانێ بژی یا بمێنێتەوە لەبەر پێکهاتنێکی بۆماوەیی genetic constitution بەزیان (inviability *n*) ◌ انویابل

**invictive** *adjective*
نەبەزیو، لەشکان‌نەهاتوو، نابەزێ ◌ مغلوب‌نشدنی

**invidious** /ɪn'vɪdiəs/ *adjective*
1 بە غەرەزەوە، بە کینەوە، بەرچاوداگیراوانە، لە ڕووی ڕقەوە، نادادگەرانە، ناخۆش، بێزەوەن، قینەوەن: *invidious remarks* 2 بەئێرەیی

invidiously /ɪn'vɪdiəsli/ adv) لـه رووی رقـەوە، بە قینەوە، بە کینەوە؛ invidiousness /ɪn'vɪdiəsnəs/ n: بـەغیلی، ئیرەیی، بەرچاوداگیراوی) ◌ 1 مغرضانه، عصبانی کننده، نفرت‌انگیز 2 حسادت‌انگیز

**invigilation** /ɪn,vɪdʒɪ'leɪʃn/ *noun*
(تـاقی کـاری) چاوبەسەرەوەبوون، چـاودێری، ئاگاداری ◌ مراقبت

**invigilator** /ɪn'vɪdʒɪleɪtə(r)/ *noun*
چاوبەسەرەوەبوو، چاودێر، ئاگادێر ◌ مراقب

**invigorating** *adjective*
کەیف‌سازکەر، گوڕپێدەر، بووژێنەر، خۆش: *an invigorating walk/shower* (invigoratingly *adv*) ◌ نیروبخش، فرح‌بخش

**invigoration** /ɪn,vɪgə'reɪʃn/ *noun*
هێزداری، گوڕپێدان، بەهێزکردن، بووژاندنەوە، گورجاندن (invigorative *adj*؛ invigorator *n*؛ invigoratively *adv*) ◌ تقویت، نیروبخشی

**invincibility** /ɪn,vɪnsə'bɪləti/ *noun*
لەشکاننەهاتوویی، نەبەزیوی، نەبەزی، بەسەردازاڵنەبوویی، کۆڵنەدەری: *He had an aura of invincibility* ◌ شکست‌ناپذیری

**invincible** /ɪn'vɪnsəbl/ *adjective*
1 لەشکاننەهاتوو، نەبەز(یو)، بەسەردازاڵنەبوو، نابەزێ، ناشکێنرێ، بەهێز، کۆڵی پێنادرێ، بەقەوەت، نەبەرد، کۆڵنەدەر: *The team seemed invincible* ◊ *a seemingly invincible army* 2 نەڕووخ، پتەو، تۆکمە، قایم: *an invincible belief in his own ability* (invincibly /ɪn'vɪnsəbli/ *adv*؛ invincibleness *n*) ◌ 1 شکست‌ناپذیر 2 راسخ

**inviolability** /ɪn,vaɪələ'bɪləti/ *noun*
پیرۆزی، حورمەت، پێشێلنەکراوی، نەبەزێنراوی، پارێزراوی (inviolableness *n*) ◌ مصونیت، تخلف‌ناپذیری

**inviolable** /ɪn'vaɪələbl/ *adjective*
پیرۆز، جێی‌ڕێز، پێشێل‌نەکراو، نەبەزێنراو، نابێ بشکێنرێ، دەبێ بپارێزرێ، پارێزراو: *the inviolable right to life* - ◌ مصون، تخلف‌ناپذیر

**inviolably** /ɪn'vaɪələbli/ *adverb*
پارێزراوانە، بە شێوەیەکی پیرۆز ◌ به طور مصون

**inviolacy** *noun*
پیرۆزی، پارێزراوی، نەبەزێنراوی، حورمەت‌ڕاگیراوی، ڕەچاوکراوی، بێڕێزنەبوویی، پێشێل‌نەکراوی، نەشکێنراوی، حورمەت‌نەشکاوی، نەگۆڕاوی ◌ مصونیت، نقض‌نشدگی

**inviolate** /ɪn'vaɪələt/ *adjective*
پیرۆز، پارێزراو، نەبەزێنراو، حورمەت‌ڕاگیراو، نەشکێنراو، ڕەچاوکراو، بێ‌ڕێزنەبوو، بێڕێزی پێ نەکراو، دەس‌تێوەرنەدراو، دروست‌ڕاگیراو، پێشێل‌نەکراو، نەگۆڕاو: *Their privacy remained inviolate* (inviolateness *n*) بنەڕەت: لە *inviolatus* لاتین، لە -*in* "نا" + *violare* "شکاندن، پێشێل‌کردن، بێڕێزی پێ‌کردن، سەرپێچی کردن violate") ◌ مصون، نقض‌نشده

**inviolately** /ɪn'vaɪələtli/ *adverb*
نەشکێنراوانە، نەبەزێنراوانە ◌ به طور نقض‌نشده

**invisibility** /ɪn,vɪzə'bɪləti/ *noun*
نەبینراوی، لەبینین‌نەهاتوویی، بەرچاونەهاتوویی، نادیاری ◌ نامرئی بودن

**invisible** /ɪn'vɪzəbl/ *adjective*
*adj* نەبینراو، لەبینین‌نەهاتوو، بەرچاونەهاتوو، نەدیتراو، نادیار، hidden، imperceptible، inconspicuous *n* (invisibles) هاوردە و هەناردەی نەبینراو ◌ *adj* نامرئی، غیرقابل رؤیت *n* (در جمع) واردات و صادرات نامرئی

**invisible exports** *noun, pl.*
هەناردە(مەنی)ی نادیار یان نەبینراو ◌ صادرات نامرئی یا نامحسوس

**invisible imports** *noun, pl.*
هەناردە(مەنی)ی نادیار یان نەبینراو ◌ صادرات نامرئی یا نامحسوس

**invisible ink** *noun*
جەوهەری نەبینراو یان نادیار (بۆ نووسینی پەیامی نهێنی بەکاردێنرێ) ◌ مرکب نامرئی

**invisible mending** *noun*
دوورینەوە، درووندەوە، چنینەوە (کە وا بێ دیار نەبێ (یان دیاری نەدا) ◌ رفو

**invisible trade** *noun*
بازرگانی نادیار، کارداری نادیار یان نەبینراو ◌ تجارت نامرئی

**invisibly** /ɪn'vɪzəbli/ *adverb*
نادیارانە، نەبینراوانە، بە شێوەیەکی نەدیتراو ◌ به طور نامرئی

**invitation** /,ɪnvɪ'teɪʃn/ *noun*
1 بانگێشتن، بانگهێشتن، لێ‌گیرانەوە، خوولککردن، بانگ‌کردن: *to issue/extend an invitation* 2 داوا، داخوازی، خوایشت 3 بانگێشتنامە 4 هاندەر، بزوێنەر ◌ 1 دعوت 2 درخواست 3 دعوت‌نامه 4 مشوق

**invitational** /,ɪnvɪ'teʃənl/ *adjective*
بانگێشت‌کراو، لێ‌گیرانەوەیی ◌ دعوتی

**invitatory** /ɪn'vaɪtətəʊrɪ/ *adjective*
بانگێشت‌کراو، لێ‌گیرانەوەیی ◌ دعوتی

**invite** /'ɪnvaɪt/ *noun*
کارتی لێ‌گیرانەوە، کارتی بانگێشتن، بانگێشتن‌نامە ◌ کارت دعوت

**invitee** *noun*
کەسی بانگهێشتن‌کراو یان بانگێشت‌کراو ◌ شخص دعوت‌شده

**inviting** /ɪn'vaɪtɪŋ/ *adjective*
سەرنج‌ڕاکێش، خۆش، دڵڕفێن، attractive: **an** *inviting smell* ◌ جالب

**invitingly** /ɪn'vaɪtɪŋli/ *adverb*
بە شێوەیەکی خۆش، سەرنج‌ڕاکێشانە ◌ بە طور جالب

**invitingness** /ɪn'vaɪtɪŋnəs/ *noun*
خۆشی، سەرنج‌ڕاکێشی ◌ جالب بودن

**in vitro** /ɪn 'vi:trəʊ, US 'vi:troʊ/ *adjective*
توێژینگەی، تاقیگەیی، لە تاقیگەدا، لە شووشەدا، لە دەرەوەی لەش(ی دایک(دا): **the** *development of in vitro fertilization* ◌ آزمایشگاهی

**invitrofertilization** *noun*
پرۆسەی دانانی تۆمی چاک‌کراو لەنێو لەشی ژندا ◌ انتروفرتیلیزیسیون

**in vivo** /ɪn 'vi:vəʊ, US 'vi:voʊ/ *adjective, adverb*
لە نێوەوەی لەش، نێولەشی، لە لەش‌دا، ئین‌ڤیڤۆ ◌ در داخل بدن، ان ویو

**invocation** /ˌɪnvə'keɪʃn/ *noun*
1 داوای یارمەتی، بەزەیی‌پیاهاتن، داوێن‌گرتن، دەسەوداوێن، داوێن‌گیری، پارانەوە، تکاکردن، کڕووزانەوە، پەنابردنەبەر، هانابردن 2 دۆعا، نزا 3 وێرد، دیوبەند، نووشتە (خوێندنەوە) 4 بانگ‌کردن، لێ‌گیرانەوە (invocational *adj*) ◌ 1 استمداد، استغاثه، توسل 2 دعا 3 ورد 4 احضار

**invocatory** /ɪn'vɒkət(ə)ri/ *adjective*
دۆعایی، نزایی ◌ دعایی

**invoice** /'ɪnvɔɪs/ *noun*
بارنامە، لیستە، بیل، هێنمان: **an** *invoice for £250* ◌ صورت حساب، فاکتور

**involucre** /'ɪnvəl(j)u:kə/ *noun*
(توێکاری) بەرگی پەردەیی، بەرگ ◌ پوشش غشایی، پوشش

**involucrum** *noun*
بەرگی پەردەیی، بەرگ ◌ پوشش غشایی، پوشش

**involuntarily** /ɪn'vɒləntrəli, US ɪnˌvɑ:lən'terəli/ *adverb*
خۆنەویستانە، بە نائەنقەست، نامەبەستانە ◌ بە طور غیرارادی، غیرعمدی

**involuntariness** /ɪn'vɒləntrinəs, US ɪn'vɑ:lənterinəs/ *noun*
خۆنەویستی، خۆنەویستەبوون، بەدەس‌خۆنەبوون ◌ غیرارادی بودن

**involuntary** /ɪn'vɒləntri, US ɪn'vɑ:lənteri/ *adjective*
1 خۆنەویست، خۆنەویستە، خۆنەخواستە، بەدەس‌خۆنەبوو: *an involuntary cry of pain* 2 زۆرەملی، ناچاری، تەنگەتاوی: *involuntary* **the** *involuntary* ◊ *childlessness* *repatriation of immigrants* ◌ 1 غیرارادی، غیرعمدی 2 اجباری، اضطراری

**involute** /ɪn'vəlu:t/ *adjective*, also involuted
1 ئاڵۆز، پێچەڵاوپێچ 2 (گەڵا) هەڵگەڕاو، لوول‌بوو (ب.ت. قەراغەکەی): *an involute* *leaf* ◌ 1 پیچیده 2 برگشته به داخل

**involuted** = 1 complicated 2 abstruse

**involution** /ˌɪnvə'l(j)u:ʃn/ *noun*
1 ئاڵۆزی، پێچەڵاوپێچی، ئاڵۆسکاوی 2 هەڵگەڕاوی 3 چوونەیەکی ئەندامێ لە تەمەنی پیری یان بێ‌چالاکیدا (involutional *adj*): سەربە involution) ◌ 1 پیچیدگی 2 برگشتگی به داخل 3 انولسیون

**involved** /ɪn'vɒlvd, US ɪn'vɑ:lvd/ *adjective*
1 ئاڵۆز، پێچەڵاوپێچ، پێچاوپێچ 2 پێوەبوو، گیرکردوو، تێوەگلاو، تێکەوتوو، تووش‌بوو، تێ‌گیر، وەردراو ◌ 1 پیچیده، بغرنج 2 درگیر

**involvement** /ɪn'vɒlvmənt, US -'vɑ:lv-/ *noun*
1 کێشە، پرس، پێوەبوون، تێوەگلان، تووش‌بوون، دوچاربوون، تێ‌کەوتن، تێ‌گیران، دەس‌تێ‌هاوێژران، گیرکردن، بەسەرەوەتێ‌کەوتن، تێ‌وەردران 2 ئاڵۆزی، پێچاوپێچی، پێچەڵاوپێچی 3 (ماڵی) گوشار، تەنگانە ◌ 1 معضل، گرفتاری، درگیری 2 پیچیدگی 3 مضیقه

**invulnerability** /ɪnˌvʌlnərə'bɪləti/ *noun*
بریندارنەکراوی، لەبریندارنەهاتوویی، ئێش‌پێ‌نەگەیشتوویی، لێ‌نەدراوی، زەربەلێ‌نەکەوتوویی، هیچ‌لێ‌نەهاتوویی، زەربەلێ‌نەدراوی، پاریزراوی، لەدەس‌بردن‌نەهاتوویی، دەس‌بۆنەبراوی ◌ زخم‌ناپذیری، آسیب‌ناپذیری

**invulnerable** /ɪn'vʌlnərəbl/ *adjective*
بریندارنەکراو، لەبریندارنەهاتوو، لێ‌نەدراو، زەربەلێ‌نەکەوتوو، هیچ‌لێ‌نەهاتوو، زەفەرپێ‌نەبراو، زەربەلێ‌نەدراو، پارێزراو، لەشکان‌نەهاتوو، ناشکێ، دەس‌بۆنەبراو، کەس ناتوانێ دەستی بۆ بەرێ: *to be in an -erable position* ◌ زخم ناپذیر، آسیب‌ناپذیر، مصون

**invulnerably** /ɪn'vʌlnərəbli/ *adverb*
دەس‌بۆنەبراوانە، پارێزراوانە ◌ به طور مصون

**inwale** /'ɪnweɪl/ *noun*
لێواری بۆ نێوەوەی گەمی ◌ لبه‌ی داخلی قایق

**inwall** *noun*
دیواری نێوەوە یان ژوورەوە ◌ دیوار داخلی

**inward** /'ɪnwəd, US -wərd/ *adjective*
1 لە نێوەوە، نێوەکی، هەناوی، مەعنەوی، مانایی، ژوورەکی 2 بەرەو نێوەوە، روو لە نێوەوە ◌ 1

داخلی، باطنی، معنوی 2 به سوی داخل
**inward(s)** *adverb*
بەرەو نێوەوە، روو لە ژوورەوە: *The door opens -ards* ◌ به سوی داخل
**inward investment** *noun*
سەرمایەنانەوەی دەرەکی (سەرمایەیێ کە لە لایەن دەرەوە و لە نێوخۆی وڵاتدا نراوەتەوە) ◌ سرمایەگذاری خارجی
**inward-looking** *adjective*
خۆبین، خولەبیر، قووڵەوەبوو لە کاروباری خۆیدا، لەخۆداگلاو ◌ خوداندیش، خودخواه
**inwardly** /ˈɪnwədli, US -wərd-/ *adverb*
لە نێوەوە: *I was - ◊ She groaned inwardly rdly furious* ◌ از درون
**inwardness** /ˈɪnwədnəs, US -wərd-/ *noun*
هەناو، تایبەتمەندی مەعنەوی یان مانایی ◌ باطن، ویژگی معنوی
**inyanga** /ɪnˈjɑːŋə/ *noun, pl.* inyangas or izinyanga
کەسێ کە کەسانی نەخۆش و دەردەدار بە ماک و مەتریالی سروشتی چارەسەر و دەرمان دەکا، وەک گیا و هتد. ◌ اینیانا
**I/O** *abbreviation* (Electronics) input-output
**Io** *noun*, Latin, from Greek *Iō*
ئایۆ: کچی خوای رووبار کە گراوی زیۆس بووە و لە لایەن زیۆسەوە کرا بە نوێتگین heifer (لە میتۆلۆژی یۆنانیدا) ◌ آیو
**iod(o)-** *prefix*
پێشگر: یۆد: *iodoform ،iodize* ◌ پیشوند: ید
**iodate** *noun*
خوێی iodic acid، وەک sodium iodate $NaIO_3$ ◌ نمک اسید یودی
**iodic** /aɪˈɒdɪk/ *adjective*
یۆدی، ئایۆدی ◌ یدی
**iodic acid** *noun*
(کیمیا) ترشەڵۆکی ئایۆدی یان یۆدی: $HIO_3$ ◌ اسید یدی
**iodide** /ˈaɪədʌɪd/ *noun*
(کیمیا) 1 ئایۆدید، ئایۆداید، ئاوێتەیێکی ئایۆدین لەگەڵ توخم یان کۆمەڵێکی تر: *sodium iodide* 2 ئاوێتەیێ کە ئایۆدینی تیایە ◌ آیود
**iodine** /ˈaɪədiːn, US -daɪn/ *noun*
یۆد، ئایۆدین (بە ژ.گ. 53، ن. I) ◌ ید
**iodine number** *noun*
ژماری یۆدی ◌ عدد یدی
**iodism** /ˈaɪədɪz(ə)m/ *noun*
(پزشکی) ژاراوایبوون بە ئایۆدین ◌ آیودیسم
**iodized salt** *noun*
خوێی یۆداوی، خوێی یۆددار ◌ نمک یددار
**iodoform** /ʌɪˈəʊdə(ʊ)fɔːm, ˈʌɪədə(ʊ)-, ʌɪˈɒdə(ʊ)-/ *noun*
ئایۆدۆفۆرم: ئاوێتەیێکی کریستاڵی زووهەڵمیو $CHI_3$، وەک خاوێنکەرەوە بەکاردێتریێ ◌ یدُفرم
**iodometer** *noun*
یۆدپێو (*iodometry n*: یۆدپێوی) ◌ یدسنج
**IOM** *abbreviation* Isle of Man
**Io moth** *noun*
جۆرێ پەپوولەی شەوگەری saturniid [*Automeris io*] ◌ نوعی پروانه
**-ion** also (-ation, ition, -sion, -tion, -xion) *suffix*
پاشگر: کار، کردە، کردەوە، کردار، دۆخ، رەوش، بار، ئەنجام، ئاکام: *validation، oblivion، hydration، communion، regulation* (بنەرەت: بە رێگای فەرەنسەوە، لە لاتینەوە) ◌ *ion-* پسوند: عمل، کنش، حالت، نتیجه
**ion** /ˈaɪən, BrE also ˈaɪɒn, US ˈaɪɑːn/ *noun*
ئایۆن، یۆن (رۆیشت، رەوت؛ بنەرەت: لە *ienai* یۆنانییەوە "رۆیشتن") ◌ یون
**ion exchange** *noun*
گۆڕینەوەی یۆنی، یۆنگۆڕکێ، رەوتگۆڕکێ ◌ تبادل یونی
**Ionian** /aɪˈəʊnɪən/ *adjective, noun*
1 *adj* ئەندامی گەلێکی کۆنی هێلینی، دانیشتووی Attica، چەند بەشێکی رۆژاوای ئاسیای بچووک و دوورگەکانی ئێژە لە سەردەمانی پێش‌کلاسیکدا 2 دانیشتووی ئایۆنیا *n* سەربە خەڵکی ئایۆنیا، ئایۆنیا یان دوورگەکانی ئایۆنیا ◌ ایونیایی
**Ionic** /aɪˈɒnɪk, US -ˈɑːn-/ *adjective, noun*
1 *adj* (بیناسازی یۆنانی) ئایۆنیایی 2 = Ionian
*n* 1 شێوازی بیناسازی ئایۆنیایی 2 زاراوەی کۆنی یۆنانی کە لە Ionia بەکاردێتریێ ◌ ایونیایی
**ionic** /aɪˈɒnɪk, US -ˈɑːn-/ *adjective*
ئایۆنی، رەوتی، سەربە ئایۆن یان یۆن ◌ یونی، وابسته به یون
**ionic bond** *noun*
بەندی ئایۆنی یان رەوتی ◌ پیوند یونی
**ionic compound** *noun*
ئاوێتەی ئایۆنی یان رەوتی ◌ ترکیب یونی
**ionic dissociation** *noun*
شیبوونەوەی ئایۆنی، لێکهەڵوەشانی ئایۆنی ◌ تفکیک یونی
**ionic equilibrium** *noun*
هاوکێشی ئایۆنی، هاوسەنگی ئایۆنی یان رەوتی ◌ تعادل یونی
**ionic lattice** *noun*
تۆڕی ئایۆنی یان رەوتی ◌ شبکەی یونی
**ionic strength** *noun*
هێزی ئایۆنی، توانستی ئایۆنی یان رەوتی ◌ قدرت یونی
**ionium** *noun*

ئـــایۆنیوم (ئیزۆتـــۆپی تیـــشکدەرەوە یـــان رادیۆئەکتیڤی سروشتی بە ژمارەی بارستەیی 230 mass number) ◌ یونیم

**ionization** /ˌaɪənaɪˈzeɪʃn, US -nəˈz-/ *noun*
ئـایۆنین، ئایۆنـان، ئایۆنانـدن، رەوتانـدن، بوونـە ئایۆن ◌ یونش، یونیزاسیون

**ionization energy** *noun*
وزەی ئایۆنان یان بوونە ئایۆن ◌ انرژی یونش

**ionizer** /ˈaɪənaɪzə(r)/ *noun*
ئایۆنەر، رەوتێنەر ◌ یونشگر

**ionosphere** /aɪˈɒnəsfɪə(r), US aɪˈɑːnəsfɪr/ *noun*
ئایۆنۆسفێر، ئایۆنگۆ، چینی ئایۆن، چینەیۆنینە: ناوچـەیێکـی کـەشـی زەوی نێـوان چینـەگـۆ stratosphere و چینـەدەرینـە exosphere، لـە چـەنـدین تـویژی ئـایۆنێنراوی ionized layer پێکهاتووە و لە 80 تا 400 کیلۆمیتر (50 تا 250 مایل) لە ژووره ئاستی زەوییەوەیە (لەوێدا ئـایۆن و ئێلیکترۆنـە کـان یـەکجـار چڕوپـڕن و دەتوانن شەپۆلەکانی رادیۆیی بداتەوە) ◌ یونکره

**ionospheric** *adjective*
سەربە ئایۆنۆسفێر (ionospherically *adv*) ◌ وابسته به یونکره

**iota** /aɪˈəʊtə, US aɪˈoʊtə/ *noun*
1 ئایوتا (نۆیەمین پیتی ئەلفوبێی یۆنانی) 2 هەرە کەم، یەکجار کەم، بە قەد سەدەدەرزی، تۆزقاڵێ، تۆزێ ◌ 1 یُتا 2 ذره

**IOU** /ˌaɪ əʊ ˈjuː, -oʊ-/ *abbreviation* I owe you
کـاغزی قـەرزاربوون: *an IOU for £100* ◌ کاغذ بدهی

**IPA** /ˌaɪ piː ˈeɪ/ *abbreviation* International Phonetic Alphabet
ئـەلفوبێی دەنـگ(ناسـی)ی جیهـانی، ئـەلفوبێی فۆنێتیکی نێونەتـەوەیی (ئـایپیئـەی(ئێـی)) ◌ الفبای آوانگار بین‌المللی

**ipecacuanha** /ˌɪpɪkakjʊˈanə/ *noun*, also ipeca
رەگـی وشـکەوەبووی دەوەنێکـی ئـەمریکای باشـووری، وەک دەرمـانی رشـانەوە یـان کۆخـە بەکاردێتێ ◌ ایپیکاکیوآنا

**iPod** /ˈaɪpɒd/ *noun*
(دروشمی بازرگانی) ئایپۆد، ئایپاد: پارچـەیێکی چکۆلـەی دەزگایێکـە کـە دەتوانـێ زانیـاری وەرگیراو لـە ئینتێرنێـت هـەلگرێتەوە و دەتـوانی لەگەڵ خۆت هەڵیگری، ب.ن. دەتوانی بەو گوێ لە موسیقا رابگری: *The iPod plays audio downloadable* ◊ *for up to 20 hours* ◌ *subway maps for your iPod* ◌ ایپاد

**ippon** /ˌɪpɒn/ *noun*
(ژاپـۆنی) خالـێ لـە جـۆدۆ، کاراتـە و وەرزشـە شەڕییەکانی تر ◌ ایپون

**ipse dixit** /ˌɪpseɪ ˈdɪksɪt, US ˌɪpsiː/ *noun*
(لاتـین) وتـەی نەسـەلمێنراو یـان دەرمارگرژانـە (واتـای خـۆی: خـودی ئـەو وتوویـەتی)، قـسـەی زۆرەملێیانە ◌ گفته‌ی اثبات‌نشده یا جزمی

**ipsilateral** /ˌɪpsɪˈlat(ə)r(ə)l/ *adjective*
هەڵکەوتوو، سەربە یان روودەدا هەر لەو لایەی لەش ◌ ایپسیلاترال

**ipsissima verba** /ɪpˌsɪsɪmə ˈvəːbə/ *noun, pl.*
(لاتـین) هـەر وەک خـودی وتـەکانی کەسـێ ◌ عین بیانات شخصی

**ipso facto** /ˌɪpsəʊ ˈfæktəʊ, US ˌɪpsoʊ ˈfæktoʊ/ *adverb*
(لاتین) تەنیا لەبەر ئەو راستییە: *You cannot assume that a speaker of English is ipso facto qualified to teach English* ◌ بـە صرف همین واقعیت

**ipso jure** /ˈɪpsəʊ ˈjʊrɪ/ *adverb*
(لاتین) بە رێگای خودی قانوونەوە، بە گـوێرەی قانوون، بەپێی یاسا ◌ قانوناً

**IQ** /ˌaɪ ˈkjuː/ *abbreviation* intelligent quotient

**Ir** symb. the chemical element iridium

**ir-** = in-

**IRA** /ˌaɪ ɑːr ˈeɪ/ *abbreviation* Irish Republican Army
سپا یـان ئەرتەشی کۆمـاریخـوازی ئیرلەنـد ◌ ارتش جمهوری‌خواه ایرلند

**Iranian** /ɪˈreɪnɪən/ *adjective, noun*
*adj* ئێرانی *n* 1 خەڵکی ئێران، ئێرانی 2 لقی زمانە ئێرانییەکان (لقێکە لە زمـانی هێنـد و ئـەورووپایی کـە کـوردی Kurdish، ئەڤێـستایی Avestan، فارسـی (Farsi) Persian، سـۆگدی Sogdi، پەشتو Pashto و هتـد لـەخۆ دەگـرێ) ◌ *adj* ایرانی *n* اهل 1 ایران 2 شاخه‌ی زبان‌های ایرانی

**Iraqi** /ɪˈrækɪ/ *adjective, noun*
*adj* ئێراقی، عێراقی *n* 1 خەڵکی ئێراق، ئێراقی، عێراقی 2 زمانی عەرەبی ئێراقی ◌ *adj* عراقی *n* 1 اهل عراق 2 زبان عربی عراقی

**irascibility** /ɪˌræsəˈbɪləti/ *noun*, also irascibleness
زووتوورەیی، توندی، هەڵـتۆزی، سـەرتوندی ◌ تندخویی

**irascible** /ɪˈræsəbl/ *adjective*
زووتـوورە، جینگـزی، تونـد، هەڵـتۆز، سـەرتوند، فیشەکی ◌ تندخو

**irascibly** /ɪˈræsəbli/ *adverb*
توورەبووانە، توندانە ◌ با تندخویی

**irate** /aɪˈreɪt/ *adjective*
بەردبەباکـەر، (زۆر) تـوورە: *irate customers*

دەرکەر، بلاوکەرەوە، پەژرێنەر ۞ منتشرکننده

**issue** /ˈɪʃuː , US ˈɪsjuː/ *noun*
1 دەرکردن، دانەدەرێ، دەرچواندن، دەرچوون، پەژراندن، دەرخستن، هاتنەدەر، هەڵقوڵین: *the issue of blankets to the refugees* 2 بلاوکردنەوە، پەخش، چاپ، وەشان 3 (کوین) لێدان: *a special issue of stamps* 4 (رۆژنامە) ژمارە، دانە: *The article appeared in issue 25* 5 پرس، مەزار، دۆز، پرسگرێک: *a sensitive ◊ key/controversial issue* 6 داهات 7 بەرهەم، ئەنجام، پێشازۆ، ئاکام 8 دوواوان، ریزگە، دەم 9 دەروو، دەرەتان، رێگا 10 منال، بەرە، فرزەند: *He died without issue* 11 رەگەز، نژاد ۞ 1 صدور، خروج 2 توزیع، پخش، انتشار، نشر 3 ضرب 4 نسخه 5 مسأله، موضوع 6 درآمد 7 حاصل، پیامد 8 مصب 9 ممر 10 (حقوقی) اولاد 11 نژاد

**issueless** /ˈɪʃuːlɪs/ *adjective*
بێئەنجام، بێپێشازۆ، بێئاکام ۞ بدون پیامد

**-ist** *suffix*
پاشگر: ـخواز، ـگەر، ـباوەر، ـکار، ـکەر، ـندە، ـچی، لایەنگر، دواکەوتوو، شوێنکەوتوو، ـلێدەر، ـژەن: *flautist* *hedonist*؛ ئاماژە بە کەسێ کە کارێ دەکا (بە کارێ verb دەردەبڕدرێ کە کۆتایی بە *-ize* هاتووە: *plagiarist*)؛ ئاماژە بە ئەندامی پیشە یان چالاکییەکی بازرگانی و کاری: *dentist* (بنەرەت: لە *-iste* فەرەنسی کۆنەوە، *-ista* لاتین، لە *-istēs* یونانییەوە) ۞ پسوند: گرا، خواه، گر، کننده، کار، پیرو، طرف‌دار، نواز؛ اشاره به انجام‌دهندەی کاری؛ ایست

**-istic** *suffix*
پاشگر: سەربە، پێوەندی هەیە ۞ پسوند: وابسته به

**isthmian** /ˈɪsθmɪən, ˈɪstm-, ˈɪsm-/ *adjective*
تەنگەلانی، باریکەلانی ۞ تنگەای

**isthmus** /ˈɪsməs/ *noun*,
1 (*pl.* isthmuses) تەنگەلان، باریکە، باریکەلان 2 (*pl.* isthmi) (توێکاری) باریکە، باریکەلان (بنەرەت: بە رێگای لاتین لە *isthmus* یونانییەوە) ۞ 1 تنگه 2 گردونه

**it** /ɪt/ *pronoun*
1 (جێناوی کارا، سێیەم کەسی تاک) ئەو 2 (جێناوی بەرکاری، سێیەم کەسی تاک) ئەو ۞ آن

**IT** /ˌaɪ ˈtiː/ *abbreviation* Information Technology
تێکنۆلۆژی زانیاری ۞ تکنولوژی اطلاعات

**Italian** /ɪˈtæliən/ *adjective, noun*
*adj* ئیتالیایی، ئیتالی، سەربە ئیتالیا *n* 1 خەڵکی ئیتالیایی 2 زمانی ئیتالیایی، ئیتالیایی ۞ *adj* ایتالیایی *n* 1 اهل ایتالیا 2 زبان ایتالیایی

**Italianate** /ɪˈtæljəneɪt/ *adjective*
بە شێوازی ئیتالیایی، ئیتالیاییناسا، شێوە ئیتالیایی ۞ به سبک ایتالیایی

**Italianism** *noun*
زاراوە یان وشەی ئیتالیایی ۞ اصطلاح یا واژەی ایتالیایی

**Italian vermouth** *noun*
ڤێرمۆتی ئیتالیایی ۞ ورموت ایتالیایی

**Italic** /ɪˈtælɪk/ *noun, adjective*
*n* لقێ لە زمانە هیند و ئەورووپاییەکان کە لاتین و زمانە رۆمانییەکان دەگرێتەوە *adj* سەربەو کۆمەڵە زمانە ۞ ایتالیک

**italic** /ɪˈtælɪk/ *adjective, noun*
*adj* ئیتالیک *n* 1 پیتی ئیتالیک 2 هێڵی لار 3 (italics /ɪˈtælɪks/) پیتە ئیتالیکییەکان ۞ *adj* ایتالیک *n* 1 حرف ایتالیک 2 خط ایتالیک 3 (italics) حروف ایتالیک

**Italiot** /ɪˈtælɪət/ *noun, adjective*
*n* دانیشتووی هەریەک لە کۆلۆنی یونانییەکانی ئیتالیای کۆن *adj* سەربەو گەلە (بنەرەت: لە *Italiōtēs* یونانییەوە، لە *Italia* "Italy") ۞ ایتالیوت

**Italo-** /ˈɪtələʊ, ɪˈtæləʊ, US -loʊ/ *prefix*
پێشگر: ئیتالیایی، سەربە ئیتالیا، ئیتالی، ئیتالیایی و...: *Italophile* ۞ پیشوند: ایتالیایی، وابسته به ایتالیا، ایتالیایی و...

**itch** /ɪtʃ/ *noun*
1 خوران، ئالوش، خارشت، ور، کلاشە: *to get/have an itch* 2 جۆرێ disorder پێستی کە خارشتی لەگەڵە: جۆرێ هەڵزلەیانی بگرەوە contagious کە بە هۆی پندیکەوە mite تووش دەبێ [*Sarcoptes scabiei*] 2 (نافەرمی) ئارەزووی بەتین، بێزوو، کرە: lust، prurience: *the creative itch* ◊ *She has an itch to travel* ۞ 1 خارش؛ ایچ 2 میل شدید یا مفرط

**itchiness** /ˈɪtʃinəs/ *noun*
خوران ۞ احساس خارش

**itching** *noun*
خوران، ئالوش، کلاشە، خارشت، ور، خورروو ۞ خارش

**itching palm** *noun*
کەلکەلەی پارە، تەماحی پارە، تەوسی پارە یان پوول، کرەی پارە ۞ حرص پول

**itching powder** *noun*
گەردەی خوران یان خارشت (بۆ شۆخی) ۞ پودر خارش

**itchless** /ˈɪtʃlɪs/ *adjective*
نەخوریو، بێخورروو، بێخارشت ۞ بدون خارش

**itch mite** *noun*

بند یان وردەکرمی خارشت: جۆرێکی مشەخۆر کە رەهۆڵ بۆ نێو پێست لێ‌دەدا و دەبێتە هۆی گەرۆڵی یان (لە گیانەوەراندا) گەری یان گەرۆڵی گۆشتی sarcoptic mange [Sarcoptes scabiei] ◌ ایچ مایت

**itchy** /ˈɪtʃi/ *adjective* (itchier, itchiest)

بەخوروو، بەئالۆش، ئالۆشاوی، خوروو دێنێ، خورێنک، خوروواوی، خورووهێنەر: *an itchy nose/rash* ◊ *I feel itchy all over* ◌ خارش‌آور

**itchy feet** *noun*

کەلکەڵەی گەران یا سەفەر، بێزووی سەفەر و گەران ◌ هوس سفر

**it'd** /ˈɪtəd/ *abbreviation* it had, it would

**-ite**[1] *suffix*

پاشگر: 1 (تەختە)بەرد، کەڤر، کان، فوسیل، بووبەرد: *anorthosite* ،*erythrite* ،*ammonite* 2 بەرهەم: *metabolite* 3 دانیشتووی، نیشتەجێی: *Israelite* 4 دواکەوتوو، شوێن‌کەوتوو، لایەنگر، پشتیوان: *Jacobite* 5 بەرە، رەچەڵەک 6 ناوی بەشە پێکهێنەرەکانی لەش یان ئەندامێ پێکدێنێ: *somite* 7 (کیمیا) ناوی ئەو خوێ و ئێستێرانە پێکدێنێ کە کۆتاییان بە *-ous* ـەوە هاتووە: *sulphite* 8 ناوی بەرهەمە بازرگانی‌یەکان یا (مەتریالی) تەقەمەنی پێکدێنێ: *dynamite* (بنەڕەت: لە *-ite*- فەرەنسە، بە ریگای *-ita* لاتینەوە، لە *ītes* یۆنانی‌یەوە) ◌ پسوند: 1 سنگ، سنگواره 2 فرآورده 3 مقیم 4 پیرو، طرفدار 5 نسل 6 اسم قسمت‌های تشکیل‌دهندەی بدن یا عضوی 7 اسامی املاح یا استرهایی که به *-ous* مختوم شده‌اند 8 اسم فراورده‌های تجاری یا مواد منفجره

**-ite**[2] *suffix*

پاشگر: 1 ئاوەڵناو دروست دەکا، وەک *composite* 2 ناو دروست دەکا، وەک *appetite* 3 کار دروست دەکا، وەک *unite* (بنەڕەت: لە *-itus* لاتینەوە) ◌ پسوند: 1 صفت‌ساز 2 اسم‌ساز 3 فعل‌ساز

**item** /ˈaɪtəm/ *noun, adverb*

*n* 1 شت، تشت، بابەت، قەڵەم، نموونە 2 نووچە، هەواڵ *adv* هەروەها، سەرەرای ◌ *n* 1 قلم، فقره، چیز، مورد 2 خبر *adv* هم‌چنین

**itemization** /-ˈzeɪʃ(ə)n/ *noun*

مووبەموو، یەکەبەیەکە، بابەت‌بەبابەت، دەنکەبەدەنکە، لیستە، لیست، خشتە ◌ جزء به جزء، لیست، جدول

**itemized** *adjective*

مووبەموو (باس‌کراو)، دوورودرێژ، چڕوپڕ ◌ مشروح

**iteration** /ˌɪtəˈreɪʃn/ *noun*

1 دووبارەبوونەوە، وتنەوە، گێرانەوە، (سەرلەنوێ) تێ‌هەڵچوونەوە 2 ڤێرژنێکی نوێ لە پارچەیێکی سافتوێری کامپیوتێر: *OfficePower is now in its seventh iteration* ◌ 1 تکرار 2 ایتراسیون

**iterative** /ˈɪtərətɪv/ *adjective*

1 دووبارەکراو، چەندبارەوەبوو 2 (رێزمان) وشەیێکی تر بۆ frequentative ) iteratively /ˈɪtərətɪvli/ *adv*) ◌ تکراری

**ithyphallic** /ˌɪθɪˈfalɪk/ *adjective*

(ب.ت. پەیکەری) چووکرەپ (بنەڕەت: بە ریگای late Latin لە *ithuphallikos* یۆنانی، لە *ithus* "stright" + *phallus* "phallus") ◌ دارای قضیب در حال نعوظ

**itinerancy** /aɪˈtɪnərənsɪ/ *noun*

گەریدەیی، گەرۆکی، گەراڵی، شارەوشارکردوویی ◌ سیار بودن

**itinerant** /aɪˈtɪnərənt/ *adjective, noun*

*adj* گەریدە، گەرۆک، گەراڵ، شارەوشارکردوو: *itinerant preacher* *n* کەسێکی گەریدە (*itinerantly adv*: گەرۆکانە) ◌ *adj* سیار *n* آدم سیار

**itinerary** /aɪˈtɪnərəri, US aɪˈtɪnəreri/ *noun, pl.* itineraries

1 بەرنامەی سەفەر، گەران‌نامە، گەشت‌نامە، سەفەرنامە: *Visits to four different countries are included in your itinerary* 2 رێڕەو، رێگا ◌ 1 برنامەی سفر، سیاحت‌نامه، سفرنامه 2 مسیر

**itineration** /aɪˌtɪnəˈreɪʃn/ *noun*

سەفەر، گەران، گەشت، گەریان (ب.ت. بە مەبەستێ) ◌ سفر، سیر

**-ition** *suffix*

پاشگر: (ناو ساز دەکا، بەرامبەری -tion وەک *audition* دا) رەوش، بار، دۆخ (لە فەرەنسەوە یان لە *-itio(n)*- لاتینەوە) ◌ پسوند: حالت

**-itious**[1] *suffix*

پاشگر: ئاوەڵناوی ئەو ناوانە پێکدێنێ کە کۆتایی‌یان بە *-ition* هاتووە (وەک *ambitious* کە ئاوەڵناوی *ambition* ە؛ بنەڕەت: لە *-itiosus* لاتین) ◌ پسوند: صفت‌ساز

**-itious**[2] *suffix*

پاشگر: (ئاوەڵناو ساز دەکا) سەربە، پێوەندی هەیە، خاوەنی، خاوەنی تایبەتمەندی، خاوەنی سروشتی، ... تیایە، وەک، وەکوو: *excrementitious* ،*fictitious* (بنەڕەت: لە *-itius* لاتین، گۆراوی *-icius* لاتین) ◌ پسوند: وابسته به، مربوط به، دارای، دارای خصوصیات، مثل

**-itis** *suffix*

پاشگر: سووتانەوە، هەوکردن، ئاوسان، ئاوسێ، هەڵاوسان، نەخۆشی: *cystitis* (بنەڕەت: لە یۆنانی‌یەوە، شێوەیێکی مێیینەی ئەو ئاوەڵناوانەی کە کۆتایی‌یان بە *ītēs* هاتووە) ◌ پسوند: التهاب،

آماس، مریضی

**-itive** *suffix*

پاشگر: (ئاوەڵناو ساز دەکا، بەرامبەر بە -ative وەک لە *positive* دا؛ بنەرەت: لە *-itif*، *-itive* فەرەنسی یا *-itivus* لاتین) ◌ پسوند: التهاب، آماس، مریضی

**it'll** /ˈɪtl/ = it will

**-itol** *suffix*

پاشگر: بۆ ئەو ناوی ئەو ئەلکولانە بەکاردێتێ کە زیاتر لە یەک کۆمەڵی هایدرۆکسیلی تیایە: *mannitol*، *xylitol* ◌ پسوند: ایتول

**-itous** *suffix*

پاشگر: (ئاوەڵناو لەو ناوانە ساز دەکا کە کۆتاییان بە *-ity* ـەوە هاتوە، وەک *calamitous* لە *calamity*، بنەرەت: لە *-iteux* فەرەنسی، لە *-itosus* لاتین) ◌ پسوند: صفت‌ساز

**its** /ɪts/ *adjective*

(ئاوەڵناوی خاوەنداری، سێیەم کەسی تاک) ـەکەی، هی ئەو، ـی: *Turn the box on its side* ◊ *The dog had hurt its paw* ◌ ـَ ش، ـ آن

**it's** /ɪts/ *abbreviation* it is, it has

**itself** /ɪtˈself/ *pronoun*

1 (جێناوی گەڕانەوەیی، سێیەم کەسی تاک) خۆی، لە خۆی، هەر خۆی، بە خۆی: *The cat was washing itself* ◊ *The company has got itself into difficulties* ◊ *Does the computer turn itself off?* 2 (جێناوی جەختی) بە خۆی، بە تەنیا، تەنیا: *The village -elf is pretty, but the surrounding countryside is rather dull* ◌ 1 (ضمیر انعکاسی) خودش را، به خودش، از خودش 2 (ضمیر تأکیدی) خودش

**itsy-bitsy** /ˌɪtsi ˈbɪtsi/ *adjective*, also itty-bitty

(نافەرمی، ب.ت. لە ئەمریکا) تۆزێ، یەکجار کەم، کەمووسکەیێ، زۆر چکۆلانە، تۆزقاڵێ، نیسکێ، tiny: *My friends get upset over itty-bitty problems they have* ◌ یک ذره

**ITV** /ˌaɪ tiː ˈviː/ *abbreviation* Independent Television

(بریتانیا) تەلەفزیۆنی سەربەخۆ ◌ تلویزیون مستقل

**-ity** *suffix*

پاشگر: بار، دۆخ، پلە، چۆنیەتی، باشی، ـی، ـێتی، ـایەتی، ـیەتی: *humility*، *activity*، *alkalinity*، *theatricality* (بنەرەت: لە *-ité* فەرەنسی، لە *-itas*، *-itatis* لاتینەوە) ◌ پسوند: حالت، درجه، کیفیت

**IUD** /ˌaɪ juː ˈdiː/ *abbreviation* intra-uterine device

**-ium** *suffix*

پاشگر: 1 توخم یان ڕەگەزی کیمیایی: *sodium*؛ (هەروەها -um) ناوی توخمە کانزاییەکان ساز دەکا: *cadmium*؛ کاتیۆن: *tetrazolium* 2 ئاماژە بە ناوچەیێکی لەش (دەکا): *pericardium* 3 ئاماژە بە پێکهاتەیێکی زیندەناسییانە یان بایۆلۆژیکی (دەکا): *mycelium* 4 ئەو ناوانە پێکدێنێ کە لە لاتینەوە وەرگیراون (وەک *alluvium*) یان لەسەر بنچینەی وشەکانی لاتین و یۆنانین (وەک *euphonium*) 5 لەبری پاشگری یۆنانی -ion بەکاردێتێ و زۆرتر واتای چکۆلاندنی هەیە (کۆیەکەی -iums یان -ia، ب.ت. لە وشە ڕووەکناسییەکاندا): *pollinium*، *androecium* (بنەرەت: واتاکانی 1، 2 و 3 بە ڕێگای لاتینەوە ئەویش لە *-ion* یۆنانییەوە) ◌ پسوندی است اسم‌ساز

**I've** /aɪv/ *abbreviation* I have

**-ive** *suffix*

پاشگر: خاوەن سروشت یان ڕەوشتی تایبەت، خاوەن سروشت و تایبەتمەندی دیاریکراو، دادەشکێتەوە بەرەو، ئەوەی دەوێ، خوازیار: *palliative*، *amusive* (بنەرەت: لە *-ive*، *-if* فەرەنسی، لە *-ivus* لاتینەوە) ◌ پسوند: دارای طبیعت یا ویژگی مشخص، گراینده به

**ivermectin** /ˌʌɪvəˈmɛktɪn/ *noun*

ئاوێتەیێ لە کۆمەڵی avermectin، لە بەیتەریدا وەک کرمکوژ و بۆ چارەسەری river blindness بەکاردێتێ ◌ ایورمکتین

**ivied** *adjective*

لاولاوداگرتوو یان تەنیو، داپۆشراو بە لاولاو ◌ پوشیده از پیچک

**Ivorian** /ʌɪˈvɔːrɪən/ *adjective, noun*

*adj* سەربە کەناری عاج یان ددانی فیل، سەربە کەناری ماهی *n* خەڵکی کەناری عاج یان ددانی فیل یان کەناری ماهی ◌ *adj* وابسته به ساحل عاج *n* اهل ساحل عاج

**ivory** /ˈaɪvəri/ *noun* (*pl.* ivories), *adjective*

*n* 1 ماهی، کەلبەی فیل، شفرە، ئێسکی فیل، ددانی فیل: *a ban on the ivory trade* 2 (ivories) کلیلەکانی پیانۆ 3 (نافەرمی، ivories) ددانی مرۆڤ *adj* 1 لە ماهی، دروستکراو لە ماهی، ماهیکرد: *a priceless collection of ivories* ◊ *He had a good set of ivories* (= teeth) 2 (ڕەنگ) سپی ئامال زەرد، سپی زەردباو، شیری، ئێسکی ◌ *n* 1 عاج 2 (در جمع) کلیدهای پیانو، دندان انسان *adj* 1 عاجی 2 شیری

**ivory black** *noun*

گەردەی سووتاوی ئێسک (بۆ ڕەنگ یا کێشانەوە) ◌ ایووری بلک

**ivory nut** *noun*

بەری دارخورمای گەرمێنانی ئەمریکا

endosperm (*Phytelephas macrocarpa*)، یەکی زۆر رەقی تیایە. vegetable ivory دەگرێ
◌ فندقک

**ivory tower** *noun*
کەلووی ماهی، جیهانی خەون‌وخەیاڵ، دنیای خەیاڵ‌پلاو، برجی ماهی ◌ برج عاج

**ivy** /ˈaɪvi/ *noun*
1 ئالینـک، بـاداک، لاولاو(ە)، مەشـلەزەرگۆ، میشـلەزەرگە، گولـواز [*Hedera helix* و جۆرە پێوەندی‌دارەکان] 2 بۆ ناوی گیا لاولاوەئاسا یان هەڵچووەکانی تر بەکاردێترێ، ب.ن. poison ivy (بنـەرەت: لـە *īfig* ئینگلیـسی کۆنـەوە، بـە بنەرەت ئەڵمانی) ◌ پیچک

**Ivy League** *adjective, noun*
(سـەربە) کۆمەڵـەی یـان دەسـتەی زانکۆیـانی رۆژهەڵاتی ئەمریکا (ئەو هەشت زانکۆ کۆنەی باکووری رۆژهەڵاتی ئەمریکا) ◌ (وابسـتە بـە) گروە دانشگاه‌های شرق امریکا

**iwi** /ˈiːwi/ *noun, pl.* same
(نیوزیلەند) کۆمەڵ، کۆمەڵگا، گەل، خەڵک ◌ جامعه، مردم

**ixia** /ˈɪksɪə/ *noun*
(رووەکناسی) ئیکسیا: جۆرێ گیای ئەفریکای باشـووری، لـە تـیرەی iris [تـوخم *Ixia*: زۆر کالتیڤارن cultivar] (بنەرەت: لاتینی نوێ، لە لاتین، ئاماژە بە جۆرێ thistle) ◌ ایکسیا

**Ixion** *noun*, Latin, from Greek *Ixiōn*
ئیکسیۆن: پادشایێکی ئەفـسانەیی تیـسالی یـان تیـسالیایی Thessalian کـە چـون ویـستی هێرا Hera هـەڵـفریوێنێ، زیـۆس بـەسـتی بـە چەرخێکەوە لە تارتاروس Tartarus کە هەمیشە دەسووڕاوە ◌ ایکسیون

**ixodid** *adjective, noun*
سەربە خێزانێکی (Ixodidae) گەنەکانەوە هەیە (وەک American dog tick و deer tick)، قاوخێکی سەختی دەرەوەیان هەیە ◌ ایکسودید

**Iyyar** /ˈiːjɑː/ *noun*
(لـە رۆژژمێـری جوولەکـەدا) ئـەیار، مـانگی هەشـتەمی فـەرمـی یـا نـادینی civil و مـانگی دووەمی دینی (بنەرەت: لە *ʼiyyār* عیبری‌یەوە)
◌ ایار

**-ization** (also -isation) *suffix*
پاشگر: کردە، کار، کاردار، دۆخ، بار، کردنەـ ـنانـدن، ئـەنجـامی دروسـتکـردن، ئاکـامی سـازکردن: *immunizatio socialization* ◌
پسوند: عمل، حالت، نتیجه‌ی ساختن، ـسازی

**-izationally** (also -isationally) *suffix*
پاشگر: ئاوەڵکار ساز دەکا: *organizationally*
◌ پسوند: قیدساز

**izba** *noun*, also isba
مالـی نـەریـتی لـە مـوورە log هـی دێیـەکـانی رووسیە ◌ ایزبا

**-ize** (also -ise) *suffix*
پاشـگر: کـردن، دروسـتکـردن، ئانـدن، جێبـەجێکـردن، بـوون، بوونـە: *privatize* *Americanize* (بنەرەت: لە *-iser* فەرەنسی، لە - late Latin *izare*، لە *izein*- یۆنانی‌یەوە) ◌
پسوند: ساختن، کردن، شدن، تبدیل شدن به

**Iznik** /ˈɪznɪk/ *adjective*, also Isnik
سەربە هونەری گڵێنە(گەری) سـەدەکانی 16 و 17 لـە Iznik، شـارێ لـە بـاکووری رۆژاوای تورکیە ◌ ایزنیک

**izzard** *noun*
(لە زمانی رەمەکی یان گفت‌وگۆدا) پیتی زید ◌ حرف زد

# J j

**J¹, j** /dʒeɪ, *pl.* Js, J's, j's /dʒeɪz/ *noun*
1 جیـی، جـەی (= دەیـەمین پـیتی ئـەلفوبێی ئینگلیـسی) 2 ئاماژە دەکا بە بابەت یان دەستە شتێکی پاش I (یلە، ریز، چین و پۆلی دەیەم) 3 (کـۆن، لـە ژمـارەنووسـی رۆمـی سـەدەکـانی نێوەراستدا) ئەم پیتە وەک ژمارەی یەک وابووە و ئەمرۆکانەش لە نوسخە پزشکی‌یەکاندا وەک پیتی گەورەی I هەر بەو مانایە بەکاردێترێ 4 شتێ کە شێوەی پیتی J دەدا 5 ئاماژە بە دەنگێ دوای I لە دەستەیێ لە شتەکان، بابەتەکان و هتد ۞ جی

**J²** *abbreviation* 1 joule(s) 2 Journal 3 Judge 4 Justice

**jab** /dʒæb/ *noun*
1 لێـدان، مـشتەکۆلە، سـیخورمە، تـێ‌ژەنـین، پیاکردن، تێ‌کوتان، تێ‌وەژاندن 2 دەرزی، کوتان ۞ 1 ضـربە، سکـزنی 2 آمپول، واکسن

**jabber** /ˈdʒæbə(r)/ *noun*
بلمەبـلم، مرەمـر، سرتەسرت، سـرت‌وهـۆر ۞ وروور، پچ‌پچ

**jabberer** /ˈdʒæbərə(r)/ *noun*
بلمێنەر، بلمەبلم‌کەر، مرێنەر ۞ ورورکننده

**jabberwocky** /ˈdʒabəˌwɒki/ *noun, pl.* jabberwockies
زمان یـان قـسەی لێ‌تێنەگەیـشتوو (بنـەرەت: لە سـەرنـاوی هۆنراوە بێ‌ماناکـەی لێـویـس کـارۆل *Through the Looking* " Lewis Carroll *Glass* (1871)") ۞ زبان یا سخن نامفهوم

**jabiru** /ˈdʒabɪruː/ *noun*
جابیرۆ: لەکلەکێکی مل‌رەشی زلە، دەنووکی قیتە (ئـەمریکـای *Ephippiorhynchus mycteria*] ناوەندی و باشووری) و جۆرە پێوەندی‌دارەکان] (بنەرەت: لە *jabirú* توپی-گوارانی) ۞ جابیرو

**jaborandi** /ˌdʒabəˈrandi/ *noun*
1 دەرمانێ لە گەڵای وشکەوەبووی هێندێ گیای ئەمریکای باشووری دەگیرێ 2 گیا یان رووەکی ئـەو دەرمانـە [*Pilocarpus jaborandi* و جۆرەکانی تر] (بنەرەت: لە *jaborandi* -Tupi Guarani بە واتای "کەسێ کە تف دەکاتەوە a "person who spits") ۞ جابوردانی

**jabot** /ˈʒæbəʊ, US -boʊ/ *noun*
ژابـۆ، چـینی پێـشەوەی کـراس (چ پیـاوان و چ ژنان، بنەرەت: لە فەرەنسی‌یەوە) ۞ ژابو

**jaboticaba** *noun*
ژابۆتیکابا: دارێکی برێزیلی لە خێزانی myrtle لە ناوچە گەرمەکـاندا لەبەر میوە خۆراکی‌یە ئەرخەوانی‌یەکەی دەچەقێنرێ [ *Myrciaria cauliflora*] ۞ ژابوتیکابا

**jacal** /həˈkɑːl/ *noun, pl.* jacales /həˈkɑːleɪz/ or jacals
(لە مـەکـسیکۆ و باشـووری رۆژاوای ئـەمریکا) کۆختـەی چەپـەری، چەپەرسـواخ (بنـەرەت: لـە *xacalli* ناواتـل، کورتـەی *xamitl calli* "ماڵی خشتی") ۞ جاکال

**jacamer** /ˈdʒakəmɑː/ *noun*
باڵندەیێکی مێرووخۆری کلک‌درێژی دارستانە گەرمێنـەکانی ئـەمریکا، دەنـووکی تیـژ و درێـژە [خێزان Galbulidae: چەندین جۆرن] ۞ جاکامر

**jacana** /ˈdʒakənə/ *noun,* jaçana /ˌdʒasəˈnɑː/
جـۆرێ بالـندەی چکۆلـەی wading bird ی گـەرمێنان [خێـزانی Jacanidae: چـەنـدین جۆرن] ۞ نوعی پرنده

**jacardana** /ˌdʒakəˈrandə/ *noun*
درەختێکی گەرمێنانی tropical ئەمریکا بە گەڵای شێوە سەرەخس fern و دارێکی بۆنخۆشەوە fragrant [تۆخم *Jacaranda*] ◯ جاکاراندا

**jacinth** /ˈdʒasɪnθ, US ˈdʒeɪ-/ *noun*
hyacinth جۆرێ گەوهەری پرتەقاڵی سوورباو؛ ◯ سنگ یمانی

**jacinthe** *noun*
رەنگی پرتەقاڵی گەش ◯ رنگ نارنگی روشن

**jack**[1] /dʒæk/ *noun*
1 هەڵێن، جەک، بەرزەک 2 (یەرێن) سەرباز 3 ئاڵای کەشتی 4 جۆرێ زرێ 5 کابرا، بنیادەم، کوڕ، مرۆ، پیاو 6 شاگرد، بەردەست، کارەکەر، نۆکەر 7 (ئافەرمی، ئەمریکا) پارە، پوول، دراو، کوین، سکە، میت، مووش 8 سەری دووکەڵکێش 9 (لە بۆلینگدا) تۆپی (چکۆلەی) سپی 10 شتێ بۆ هەڵگەڕاندنەوە یا سووڕاندنی شیش، شیشوەرگێر 11 نێری هێندێ گیانەوەر، وەکوو کەر و merlin 12 بۆ ناونانی ئەو گیانەوەر و رووەکانە بەکاردێرێ کە لە هاوشێوەی خۆیان چکۆلەترن، بۆ نموونە jack pine 13 جۆرێ ماسی دەریایی perchئاسا، بە پوولەکەی دڕ لە هەردوو لایەوە [خێزان Carangidae: گەڵێ جۆرن] 14 (Jack) ناو) ژاک، یەعقووب ◯ 1 جک 2 سرباز 3 پرچم کشتی 4 نوعی زره 5 آدم، مرد 6 پادو 7 پول، سکه 8 کلاهک دودکش 9 توپ سفید 10 جک 11 نرەی برخی جانوران 12 جک 13 نوعی ماهی 14 (با J) یعقوب، ژاک

**jack**[2] /dʒæk/ *noun*
1 (مێژوویی) = blackjack4 2 کەوای بێقۆڵی سەربازانی پیادە ◯ فرنجی بدون آستین سربازان پیاده

**jackal** /ˈdʒækl, US -kɔːl/ *noun*
چەقەڵ، تۆر، واوێک، بڕقەندەرە [تۆخم *Canis*: چوار جۆرن] ◯ شغال

**Jack-a-Lent** *noun*
1 بووکەپووشینەیێ کە کاتۆلیکەکان لە سەروبەندی Lent دا بۆ سەرقاڵی ئاوریان تێبەردەدا 2 مرۆی سادە و هیچەکە ◯ 1 جک لنت 2 آدم سادەلوح و بی‌اهمیت

**jackanapes** /ˈdʒækəneɪps/ *noun*
1 منالی هاروهاج، شەیتان، چاودەرهێن، روودار 2 (کۆن) مەیموونی دەستەمۆ یان دەسەڵێن ◯ 1 بچەی تخس 2 میمون رام‌شده

**jackass** /ˈdʒækæs/ *noun*
1 نێرەکەر، گوڵەکەر 2 بنیادەمی کەر و نەفام ◯ 1 نره الاغ 2 آدم احمق

**jackassery** *noun*
کەرێتی، گەوجێتی، نەفامێتی ◯ حماقت

**jackboot**[1] /ˈdʒækbuːt/ *noun*
پۆتین، چەکمەی سەربازی ◯ چکمەی نظامی

**jackboot**[2] /ˈdʒækbuːt/ *noun*, under the jackboot
1 لەژێر دەسەڵاتی، لە ژێر رمی، (لە) ژێر چەکمەی سەربازان، لەژێر رکێفی، لەژێر سەرکوتی سەربازی 2 زۆرداری ◯ 1 تحت سلطەی 2 استبداد

**jackbooted** *adjective*
چەکمەپۆش ◯ چکمەپوش

**Jack-by-the-hedge** *noun*
(رووەکناسی) جۆرێ گیای گوڵسپی لە تیرەی کەلەم، گەڵاکانی بۆنی سیر دەدەن کاتێ بیکوتی یان بیهارییەوە [*Alliaria petiolata* خێزانی Cruciferae] ◯ نوعی گیاه

**Jack cheese** = Monterey cheese

**jackdaw** /ˈdʒækdɔː/ *noun*
قەلەرەشە، قشقەرە، قەلەباچکە، قاز، قاژوو، قەلەبازەڵە، قەلەزارە، قەلەسابوونە [تۆخم *Corvus*، دوو جۆرن، ب.ت. ئوراسیایی (یەکەی) *C. monedula*] ◯ زاغچە

**jacket** /ˈdʒækɪt/ *noun*
1 کەوا، فەرەنجی، شەپک، چاکەت، ژاکێت، کۆت، چەرم، بەرگ، رووپۆش، داپۆشە (چۆغە jacket homespun) 2 (روو)بەرگی کتێب 3 تۆخلی یەرەڵماسی، توێکڵی پەتاتە ( jacketless *adj*) ◯ 1 کت، جلد، پوشش 2 پوشەی کتاب 3 پوست سیب‌زمینی

**jacket potato** *noun*
هێرەڵماسی کوڵاو، پەتاتەی کوڵاو (بە توێخڵەوە) ◯ ژاکت پوتاتو

**jackfish** *noun. pl.* same or jackfishes
pikr یان sauger، ب.ت. پایکی باکووری ◯ نوعی ماهی

**Jack Frost** *noun*
مامسەرما، مامشەختە، جەک فراست ◯ ننەسرما

**jackfruit** /ˈdʒækfruːt/ *noun*
جۆرێ داری میوەزلی زووهەڵدەری گەرمێنانی ئاسیا، شێوەی breadfruit دەدا [ *Artocarpus heterophyllus*] ◯ درخت نان صحرایی

**jackhammer** /ˈdʒækhæmə(r)/ *noun*
(زۆرتر ئەمریکای باکووری) سمۆی چەکوشی، مەتەی چەکوشی، سمۆی کێوبری، سمۆ یان بورغووی بەردبڕ ◯ متەی ضربەای

**jack-in-office** *noun*
فەرمانبەری خۆبەزلزان، میرزافیزنە، کاکەمیرزا ◯ کارمند خودپسند

**jack-in-the-box** *noun*
شەیتانۆکە: جۆرێ شتی کایەی منالانە ◯ علی‌وزجه

**jack-in-the-pulpit** *noun*
arum یکی ئەمریکای باکووری [ *Arisaema*

*triphyllum*] ۞ نوعی گیاه

**jack-knife** /'dʒæknaɪf/ *noun, pl.* jackknives

1 چەقۆی گیرفانی 2 خۆلوول‌کردنی ئاوەژووانە، خۆهاویشتنی بەراوەژوو (تێو ئاو) ۞ 1 چاقوی جیبی 2 شیرجەی جک

**jack-knife clam** = North American term for razor shell

**jackknife fish** *noun*

ماسی‌یێکی بە باڵ یا پەڕەی سەرپشتی قیت و درێژ، لە ئاوە گەرمەکانی رۆژاوای ئەتلانتیک دەژی [*Equetus lanceolatus*] ۞ نوعی ماهی

**jackleg** *adjective*

1 (نافەرمی) کاتی، کاتەکی، بەرەوەخت، ناڕاستەوخۆ. 2 makeshift ناڕاست، ناپاک، ناشارەزا، ناشی. بەیدەس: ◊ *a jackleg lawyer* ◊ *a jackleg carpenter* ۞ 1 موقت، غیرمستقیم 2 نادرست، ناشی

**jack mackerel** *noun*

جۆرێ ماسی لە تیرەی jack، هی رۆژهەلاتی پاسیفیک [*Trachurus symmetricus*] ۞ نوعی ماهی

**Jack-of-all-trades** *noun*

بنیادەمی هەمەکارە، مرۆی هەزارپیشە، سەرەندەری هەموو کارێ کردوو، کەسێکی هەزارپیشە یان هەمەکارە ۞ آدم همه‌فن‌حریف

**jack-o'-lantern** /ˌdʒæk ə 'læntən, US 'dʒækə læntərn/ *noun*

لەنتەری کوولەکەیی (تەمەڵە) ۞ فانوس کدو تنبل

**jack pine** *noun*

جۆرێ کاژی ئەمریکای باکووری، ب.ت. بۆ pulpwood بەکاردێتری [*Pinus banksiana*] ۞ نوعی کاج

**jack-plane** *noun*

رەندەی گەورە، فۆغان، شارەندە ۞ رنده‌ی بزرگ

**jackpot** /'dʒækpɒt, US -pɑ:t/ *noun*

خەلاتی گەورە، گەورەخەلات ۞ جایزه‌ی بزرگ

**jackrabbit** /'dʒækræbɪt/ *noun*

کەرویشکی ئەمریکایی (باکوور)، کەرویشکەکێوی، کەرویشکەدەشتی [توخم *Lepus*: چەندین جۆرن] ۞ خرگوش صحرایی

**Jack Robinson** /ˌdʒæk 'rɒbɪnsn, US 'rɑ:b-/ *noun*, before you can (could) say Jack Robinson

لە چاوترووکانێکدا، وەکوو ئاور، یەکجار خێرا، وەکوو تیر ۞ مثل برق

**Jack Russel** /ˌdʒæk 'rʌsl/ *noun*, also Jack Russel terrir

تاجی پێ‌کول (تاجی‌یەکی گورج بە کلکی قولەوە، بنەڕەت: لە ناوی جەنابی John (*Jack*) *Russell*، پیاوی دینی یان قەشەی ئینگلیسی، بەخێوکەری ئەو تاجی‌یانە، مەرگ 1883) ۞ جک راسل

**jackscrew** /'dʒækskru:/ *noun*

1 هەلێنی جەری یا پێچ‌دار، جەکی پێچی 2 = screw jack ۞ جک پیچی

**jacksie** *noun.* also jacksy

(بریتانیا و نافەرمی) کنگ، سمت، تەرێزە ۞ کفل، باسن

**jacksmelt** *noun*

جۆرێ silverside ی زلە، هی کەناری پاسیفیکی ئەمریکای باکووری [ *Atherinopsis californiensis*] ۞ نوعی ماهی

**Jackson Day** *noun*

هەشتەمی ژەنیوەری وەک رۆژێکی پشووی قانوونی یان فەرمی لە لویزیانا Louisiana. بۆ یادی بەرگری سەرکەوتووانەی ژێنرال ئاندریو ژاکسون لە نیوئۆرلیان New Orlean لە 1815 ۞ روز جکسون

**jackstay** /'dʒæksteɪ/ *noun*

بادەوەبەست، چارۆکەبەند، بادەوەبەند ۞ بادبان‌بند

**jackstone** /'dʒækstəʊn/ *noun*

1 زیخ، چەو، رێخ، هەلماقۆ 2 (jackstones) بازەلێن، رێخان، چەمقان ۞ 1 ریگ 2 (در جمع) نوعی بازی

**jacksy** (jacksies) = jacksie

**jack tar** *noun*

(بریتانیا و نافەرمی) مەلەوان، زریوان، sailor ۞ ملاح

**Jacob** /'dʒeɪkəb/ *noun*, from Hebrew *Ya'ăqōbh*

یەعقووب (کوری ئیسحاق و ریبێکا Rebekah) ۞ یعقوب

**Jacobean** /ˌdʒækə'bi:ən/ *adjective, noun*

*adj* سەربە پاتشایی و دەسەلاتی جیمزی یەکەم (25ـ1603) *n* کەسێ لە سەردەمی جیمزی یەکەمدا ژیاوە ۞ *adj* وابسته به سلطنت جیمز اول *n* شخص معاصر جیمز اول

**jacobean lily** *noun*

جۆرێ گیای پەبنی مەکسیکی، لە خێزانی amaryllis کە گوڵی جیا یان تەنیای سووری گەشی هەیە [*Sprekelia formossima*] ۞ نوعی گیاه

**Jacobin** /'dʒakəbɪn/ *noun*

1 ژاکۆبین (ئەندامی یانەی دیموکراتیکی تونرەو، لە 1789 لە پاریس دامەزرا، لە سەروبەندی لاوازی شۆرشی فەرەنسەدا) 2 رادیکالی تونرە 3 رەبەن یان راگەیێنەری دۆمینیک ( Jacobinic or Jacobinical *adj* Jacobinism *n*) ۞ 1 ژاکوبن 2 رادیکال افراطی 3 راهب یا مبلغ

دومینیکی

**Jacobite**[1] /ˈdʒakəbʌɪt/ *noun, adjective*
لایەنگر یان پشتیوانی جیمزی (یان جەیمز) دووەم James II پاتشای ئینگلتەرە (88-1685) و پاشینیانی ◌ طرفدار جیمز دوم پادشاه انگلستان

**Jacobite**[2] /ˈdʒakəbʌɪt/ *noun, adjective*
ئەندامی کلێسەی ئۆرتۆدۆکسی سووریەیی ◌ ژاکوبیت

**Jacob's ladder** *noun*
1 جۆرێ گیای گوڵسپی یان شین و گەڵاباریک و تیژ [*Polemonium caeruleum*] 2 نەردیوانی گوریسی یان تەنافی بە ناوبەرەی داری (ئامازە بە خەونەکەی یەعقووب بە نەردیوانەوە کە بۆ ئاسمان سەردەکەوت .Gen 28:12) ◌ ژاکوب لادر

**Jacobson's organ** *noun*, also vomeronasal organ
(گیانەوەرناسی) ئەندامی بۆن(کردن)ێ هەڵکەوتوو لەنێو دەمی مار، مارمێلک و هێندێ بڕبڕەداری تر (بنەرەت: لە ناوی توێکاری دانمارکی Ludwig L. *Jacobson* مەرگ 1843) ◌ یاکوبسون ارگان

**Jacob's staff** *noun*
مەوداپێو، میل یان داری بە نووکێکەوە، جاران بۆ پێوانی مەودا و درێژایی بەکار دەهات، میل‌پێو، دارپێو ◌ مسافت‌سنج

**jacobus** *noun, pl.* jacobuses
کۆتێکی زێڕینی ئینگلتەرە بایی 20 تا 24 شیلینگ، لە سەردەمی James ی یەکەم لێدرا، نیشانەی یەکێتی ئینگلتەرە و سکاتلەندە (unite یشی پێ‌دەڵێن) ◌ ژاکوبوس

**jaconet** /ˈdʒakənɪt/ *noun*
کوتاڵ یان پارچەیێکی کەتانی سووک (بنەرەت: لە *Jagannāth(purī)* هێندی (ئێستا *Puri*) لە هیندوستان، شوێنی پەیدابوونەکەی) ◌ ژاکونیت

**jacquard** /ˈdʒeɪk(ə)ri/ *noun*
دەزگایەکی تایبەتی بۆ دانانی نەخش لەسەر پارچە (بنەرەت: لە ناوی جۆڵای فەرەنسی Joseph M. *Jacquard*) ◌ جاکوارد

**jacquerie** /ˈdʒeɪk(ə)ri/ *noun*
راپەڕینی جووتیاران یان وەرزێران (یان لادێیان) ◌ جاکوری

**jactation** *noun*
خۆهەڵکێشان، هارەوگیفە، لافلێدان ◌ لاف‌زنی

**jactitation** /ˌdʒaktɪˈteɪʃ(ə)n/ *noun*
1 خۆهەڵکێشان، هارەوگیفە، فرۆفیشاڵ، ئیدعای پڕوپووچ 2 کرژبوونی لەش (یان ماسوولکە) ◌ 1 لاف‌زنی 2 درهم‌کشیدگی بدن

**jaculation** /ˌdʒækjəˈleɪʃn/ *noun*
هاویشتن، خستن، هەڵدان، تووڕهەڵدان ◌ پرتاب

**jaculator** *noun*
رمهاوێژ، رمخەر، نیزەخەر، نیزەهاوێژ ◌ نیزه‌انداز

**jacuzzi** /dʒəˈkuːzi/ *noun, pl.* jacuzzis
(دروشمی بازرگانی) جەکوزی (جۆرێ حەمام کە ئاوت پیادەپڕژێنێ و لەشت دادەماڵێ) ◌ جکوزی

**jade**[1] /dʒeɪd/ *noun, adjective*
*n* دانە، شەوە، یەشم، خشڵ و شتومەکی جوانی (دروس‌کراو) لە شەوە *adj* (رەنگ) سەوزی رۆشن ◌ *n* یشم، اشیا زینتی یشمی *adj* یشمی

**jade**[2] /dʒeɪd/ *noun*
1 ئەسپی کۆن یان پەک‌کەوتوو، کەلاکەئەسپ، پیرەئەسپ 2 ژنی هەرزە ◌ 1 اسب مردنی 2 زن بدنام

**jaded** /ˈdʒeɪdɪd/ *adjective*
1 تێر، لەبەرچاوکەوتوو، بێ‌ئیشتیا، دڵ‌لێ‌هەڵکەوتوو، لێ‌بێزار، لێ‌بێزراو: *jaded* 2 ماندوو، شەکەت، لەپێ‌کەوتوو، *jaded voters* ◊ *network viewers* (*adv* jadedly) exhausted ◌ 1 سیر، زده 2 خسته

**jadedness** *noun*
ماندوویی، لەپێ‌کەوتوویی، شەکەتی ◌ خستگی

**jade green** *noun*
رەنگی سەوزی مەیلەو شین یان شین‌باوی گەش ◌ رنگ سبز یشمی

**jadeite** /ˈdʒeɪdʌɪt/ *noun*
جۆرێ کانی سیلیکاتی سەوز، شین یان سپی کە یەکێ لە شێوەکانی jade یە ◌ جادیت

**jadeitic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە jadeite ـەوە هەیە ◌ وابسته به جادیت

**jade plant** *noun*
(رووەک‌ناسی) یەکێ لە چەند جۆری رووەکی گۆشتن، خێزانی orpine [توخم *Crassula*] ◌ نوعی گیاه

**jadish** *adjective*
هەرزە، سووک، بەدنێو ◌ بدنام

**jaegar** /ˈdʒeɪgə/ = skua

**Jaffa** /ˈdʒæfə/ *noun*
یافا، جەفا، جافا (جۆرێ پرتەقاڵ بە تێکولێکی ئەستوورەوە، لە ناوی شارێ لە ئیسرائیل) ◌ یافا

**jag**[1] /dʒæg/ *noun*
1 ددانە، کۆنگرە، قەڵبە، تیژایی، چوکڵە، نووکایی، قیتایی، گتایی، دەرپەڕیوی (تیژ)، دەرپۆقیوی 2 گورزە، تاخە، دەستە، بەند، باوشە، دەستەوارە، چەپک ◌ 1 دندانه، کنگره، تیزی، برآمدگی 2 دسته

**jag**[2] /dʒæg/ *noun*
1 ئارەق‌خۆری، مەی‌خواردنەوە، تێ‌تەپاندن، مەستی، سەرخۆشی 2 قۆناخ یان سەردەمی ئاستەم ◌ 1 باده‌گساری، نشئگی 2 دوره‌ی حاد

**jagged** /ˈdʒægɪd/ *adjective*
ددانەددانە، گرنج‌گرنج، گرنی‌گرنی، برگەبرگە،

ناریک، نووک‌تیژ، تیژ، نوکاوی، نوکدار، چوکڵەدار، قیت، زۆپ، گت: *jagged rocks/peaks/edges* ◌ دندانه‌دندانه، مضرس، تیز

**jaggedly** /ˈdʒægɪdli/ *adverb*
بە شێوەیەکی ددانەددانە، برگەبرگانە ◌ بە طور مضرس

**jaggedness** /ˈdʒægɪdnəs/ *noun*
دادداندەیی، گرنج‌گرنجی، برگەبرگەیی، ناریکی، تیژی، نوکداری، چوکڵەداری، قیتی ◌ مضرس بودن، تیزی

**jaggy** (jaggier, jaggiest) = jagged

**jaggery** /ˈdʒag(ə)ri/ *noun*
جۆرێ شەکری قاوەیی زبر، لە هیند ساز دەکرێ، شەکری زەرد (بنەڕەت: لە *śarkarā* سانسکریتی "شەکر") ◌ نوعی شکر

**jaguar** /ˈdʒægjuə(r)/ *noun*
(گیانەوەرناسی) جەگوار (لە خێزانی پشیلە، هی دارستانە چڕەکانی ئەمریکای ناوەندی و باشووری [*Panthera onca*]) ◌ جگوار

**jaguarundi** /ˌdʒagwəˈrʌndi/ *noun, pl.* jaguarundis
(گیانەوەرناسی) جەگوارانْدی، ڕەشەجەگوار (جۆرێ پشیلەکێوی بچووکی ئەمریکایی، لەش‌باریک و پێ‌کوڵ، لە ئاریزۆنا و ئارژانتین [*Felis yagouaroundi*]) ◌ جگواروندی

**Jah** /dʒɑː, US jɑː/ *noun*
ناوی ڕاستاقاری خودا (بنەڕەت: کورتەی Yahweh) ◌ جاه

**jai alai** /ˌhʌɪ əˈlʌɪ/ *noun*
جۆرێ کایە، شێوەی pelota دەدا ◌ نوعی بازی

**jail** /dʒeɪl/ *noun*, Brit. also gaol
گرتووخانە، زیندان، بەندیخانە ◌ زندان

**jailbird** /ˈdʒeɪlbɜːd, US -bɜːrd/ *noun*
کۆنەزیندانی، هەمیشەزیندانی، بەپێشینە (لە زیندان) ◌ سابقه‌دار

**jailbreak** /ˈdʒeɪlbreɪk/ *noun*
زیندانشکێنی، هەڵاتن، ڕاکردن، دەرچوون، دەربازبوون (لە زیندان، ب.ت. چەند کەسێ پێکەوە) ◌ فرار از زندان

**jailer** /ˈdʒeɪlə(r)/ *noun*
زیندانەوان، نۆبەداری زیندان، بەنیوان، وەردیەن ◌ زندانبان

**jailhouse** /ˈdʒeɪlhaʊs/ *noun*
(لە ئەمریکا) گرتووخانە، زیندان، بەندیخانە ◌ زندان

**Jain** /dʒeɪn/ *noun, adjective,* or Jaina
*n* لایەنگر (یان شوێنکەوتە)ی جاینیزم *adj* سەربە جاینیزم، پێوەندی بە جاینیزمەوە هەیە (بنەڕەت: بە ڕێگای هیندی لە *jaina* سانسکریت، سەربە *Jina* (بڕوانە Jina) ◌ *n* پیرو جاینیسم *adj* وابسته به جاینیسم

**Jainism** /ˈdʒeɪnɪzəm/ *noun*
دینێکی ناخواپەرستانە لە هیند، لە سەدەی شەشەمی پێش‌زایینا، ئامۆژگاری‌یەکانی لەسەر بنەمای ئازادبوون یان ڕزگاربوونی ڕۆح بەهۆی زانیاری و مەعریفەی ڕاستەقینە، باوەڕی ڕاست(ەقینە) و ڕێوشوێنی ڕاست(ەقینە)، لە بەرامبەر برەهمانیزمدا ◌ جاینیسم، جینیسم

**Jainist** /ˈdʒeɪnɪst/ *noun*
جاینیست ◌ جاینیست، جینیست

**jakes** /dʒeɪks/ *noun, pl.*
(کۆن) دەس‌بەئاوی دەرەوە ◌ مستراح بیرونی

**jalap** /ˈdʒaləp, ˈdʒɒləp/ *noun*
دەرمانی ڕەوانی، لە جۆرێ ڕەگ یان ڕیشەی گرێ‌گرێی گیایێکی هەڵچووی مەکسیکی دەگیرێ [*Ipomoea purga*] ◌ داروی مسهل

**jalapeño** /ˌhaləˈpeɪnjəʊ, -ˈpiːnəʊ/ *noun*, *pl.* jalapeños
جۆرێ بیبارەسوورەی یەکجار تیژ ◌ نوعی فلفل

**jalebi** /dʒəˈleɪbi/ *noun, pl.* jalebis
جۆرێ شیرینی هیندی ◌ جالبی

**jalfrezi** /dʒalˈfreɪzi/ *noun*
جۆرێ چێشتی هیندی ◌ نوعی غذا

**jalopy** *noun, pl.* jalopies
(نافەرمی) شڕەماشێن، چەپەرەشڕ، کەلاک، داشقەشکاو ◌ ابوطیاره

**jailor** = jailer

**jalousie** /ˈʒaluziː/ *noun*
جالۆزی، پەنجەرەی تەختەتەختە ◌ ابوطیاره

**jam**[1] /dʒæm/ *noun*
مرەبا، ڕەچەڵ ◌ مربا

**jam**[2] /dʒæm/ *noun*
1 شلووقایی، چڕەبەندان، تەمووروکایی، جەنجاڵی، ئاپۆرە، کۆمەڵکە، ڕێبەندان، ڕێبەستان، ترافیک 2 گیران، ڕاوەستان، داخران، لەکارکەوتن، پەککەوتن، گیرکردن 3 تێ‌ترنجاندن، تێ‌تەپاندن، تێ‌ئاخنین، پەستاوتن، بە زۆر تێ‌خستن 4 کۆسپ، تەگەرە، گرێپاچ، گێچەڵ، چەرمەسەری، گیرەوکێشە، دەردی‌سەری ◌ 1 تراکم، ترافیک 2 بندآمدگی 3 عمل چپاندن 4 مانع، مخمصه

**Jamaican** /dʒəˈmeɪkən/ *adjective, noun*
*adj* سەربە جامائیکا یان خەڵکەکەی، جامائیکایی *n* خەڵکی جامائیکا ◌ *adj* جامائیکایی *n* اهل جامائیکا

**jamb** /dʒæm/ *noun*
لاشیبانە، لاجامە، لاوانە، تەنشدەر، باهو (دەرگا، پەنجەرە و هتد) ◌ لُغاز

**jambalaya** /ˌdʒæmbəˈlaɪə/ *noun*
جامبالایا (چێشتێ لە باشووری ئەمریکا، بە برنج و خۆراکی دەریایی لێدەنرێ، لە *jambalaia* پرۆڤێنسایی) ◌ جامبالایا

**jambeau** /ˈdʒæmbəʊ/ *noun, pl.* jambeaux
پووزەوانە، زرێی پووز، بەلەکپێچ ◌ ساق‌پوش
**jamboree** /ˌdʒæmbəˈriː/ *noun*
1 کەرنەڤال، سووری گەورە، خۆشی، سووران، ئاهەنگ، بەزم و رەزم، میوانی گەورە 2 دانیشتن یان کۆمبین (کۆبوونەوە)ی ڕێبەران ◌ 1 جشن، جشن بزرگ، مهمانی بزرگ 2 نشست سران
**jamb shaft** *noun*
کۆلەکەی لاشیانەیی، باهۆستوون، باهۆکۆڵ ◌ ستون لغازی
**jamjar** *noun*
شووشە مرەبا، شووشە رەچەڵ، رەچەڵدان ◌ شیشەی مربا
**jammed** /dʒæmd/ *adjective*
1 تووش‌بوو، گیرکردوو، تووش‌هاتوو، گیرکەوتوو، تێوەگلاو، چەقیو، تێک‌گیراو 2 دارماڵ، تژی، پڕ ◌ 1 گرفتار، گیرافتاده 2 لبریز
**jammies** = pyjamas
**jammy** /ˈdʒæmi/ *adjective* (jammier, jammiest)
1 لیچق، پێوەچەسپیو، سرێشاوی 2 مرەباوی، مرەباپیاساوراو 3 ناوچاوان‌هێناو، بەشانس، بەبەخت، بەهات، پڕبەخت 4 ئاسان، سانا، سادە، وەکوو ئاوخواردن ◌ 1 چسبناک 2 پوشیده با مربا 3 خوش‌شانس 4 راحت
**jam-packed** *adjective*
(نافەرمی) لێوڕێژ، کەلالە، پڕاوپڕ، لێوان‌لێو، تژی، دارماڵ ◌ مملو، پر
**jam session** *noun*
(موسیقای جاز یان راک) خۆژەنی، ژەندن یان لێدان بێ‌ئامادەبوونی پێشوو ◌ بداهه‌نوازی
**Jan** *abbreviation* January
**jane** *noun*
(نافەرمی، زۆرتر لە ئەمریکا) ژن ◌ زن
**jangle** /ˈdʒæŋgl/ *noun*
1 دەنگی ناخۆش، شەق‌وکوت 2 شەڕوهەرا، هەراوهوریا، جەنجاڵی، بگرەوبەردە ◌ 1 صدای ناهنجار 2 مشاجره، قیل و قال
**jangler** *noun*
بگرەوبەردەکردوو، هەراوهوریاکردوو، جەنجاڵباز، فێرەجەنجاڵ، سەربە جەنجاڵی ◌ اهل قیل و قال
**janissary** /ˈdʒænɪs(ə)ri/ *noun,* also janizary /-z(ə)ri/, *pl.* janissaries
(مێژوویی) سەرباز عوسمانی، یەنی‌چێری، سپایی، سەرباز (بنەڕەت: *yeni* "نوێ، تازە"، *çery* "سەرباز(ان)") ◌ سرباز عثمانی، سرباز
**janitor** /ˈdʒænɪtə(r)/ *noun*
1 دەرکەوان، درگاوان، دەرگاوان، دالاندار 2 بەردەست، کارکەر ◌ 1 دربان، سرایدار 2 مستخدم
**janitress** *noun, fem.* janitor
(ژن) بەردەست، کارکەر، کارەکەر ◌ (زن) مستخدم
**jankers** /ˈdʒaŋkəz/ *noun*
(بریتانیا و لەشکری) سزای تاوانێکی سەربازی ◌ جانکرز
**Jansenism** *noun*
بزووتنەوەیەکی کریستانی سەدەکانی 17 و 18، لەسەر بنچینەی نووسراوەکانی ئایینەوانی کاتولیک Catholic theologian کورنێلیوس جانسێن Cornelius Jansen (1585–1638)؛ (Jansenistic *adj*) ◌ جانسنیسم
**Jansenist** *noun*
جانسێنیست ◌ جانسنیست
**January** /ˈdʒænjuəri, US -jueri/ *noun, pl.* Januaries
ژانەویە، ژەنیوەری، بەفرانبار، سەهۆڵبەندان، کانوونی دووەم، (یەکەمین مانگی ساڵی زایینی نێوان December و February؛ بنەڕەت: لە لاتین، واتا *Januarius (mensis)* (month) of Janus خودای رۆمی) ◌ ژانویه
**Janus** /ˈdʒeɪnəs/ *noun,* Latin
یانوس (خودای درگا و دەروازەکان، لە میتۆلۆژی رۆمی‌دا) ◌ یانوس
**janusfaced** *adjective*
دووڕوو، two-faced ،duplicitous ◌ دورو
**januslike** *adjective*
دووڕوو ◌ دورو
**Jap** /dʒæp/ *noun*
ژاپۆنی تەرەس ◌ ژاپنی کثیف
**japan** /dʒəˈpæn/ *noun*
لاکی رەش ◌ لاک سیاه
**Japan clover** *noun*
شەوەری ژاپۆنی [*Lespedeza striata*] ◌ شبدر ژاپنی
**Japanese** /ˌdʒæpəˈniːz/ *adjective, noun, pl.* same
*adj* ژاپۆنی، سەربە ژاپۆن *n* خەڵکی ژاپۆن، ژاپۆنی، زمانی ژاپۆنی ◌ *adj* ژاپنی *n* اهل ژاپن، زبان ژاپنی
**Japanese beetle** *noun*
قالۆنچەی ژاپۆنی [*Popillia japonica*] ◌ سوسک ژاپنی
**Japanese cedar** = cryptomeria
**Japanese eggplant** *noun*
باینجانەڕەشە یان کەدووەڕەشەی ژاپۆنی، باینجانەڕەشەی باریکی درێژ، توێکڵێکی ئەستووری ئەرخەوانی تیری dark purple هەیە ◌ نوعی بادنجان
**Japanese iris** *noun*
زەمبەقی ژاپۆنی، گوڵەکانی زۆر گەورە و گەشن [ب.ت. *Iris kaempferi*] ◌ نوعی زنبق

**Japanese lantern** *noun*
چرا یان لەنتەری ژاپۆنی ◌ فانوس کاغذی

**Japanese maple** *noun*
کەوتی ژاپۆنی [*Acer palmatum*] ◌ نوعی افرا

**Japanese millet** *noun*
هـــەرزنی ژاپـــۆنی [*Echinochloa frumentacea*] ◌ نوعی ارزن

**Japanese plum** *noun*
هـەڵـووژەی ژاپـۆنی [*Prunus salicina*] ◌ نوعی آلوچه

**Japanese quail** *noun*
کـەرەواڵـەی ژاپـۆنی (هـی ڕۆژهـەڵاتی ئاسـیا، جاروبار لە تویژینگەدا بەکاردیترێ [*Coturnix japonica syn. C. coturnix japonica*]) ◌ نوعی بلدرچین

**Japanese quince** *noun*
بەهێی ژاپۆنی لە خێزانی rose بە گوڵی سپی، ئاڵ یا پەمەیی [*Chaenomeles speciosa*] ◌ نوعی به

**Japanese spurge** *noun*
مراوکەی ژاپۆنی [*Pachysandra terminalis*] ◌ نوعی ماذریون

**Japan wax** *noun*
جۆری ڕۆنی زەردباوی هێندێ بەری sumac ی ئاسیایی و زۆرتر لە بواری بۆیاخ یان واکس‌دا بەکاردیترێ ◌ واکس ژاپونی

**Japanimation** /dʒəˌpanɪˈmeɪʃ(ə)n/ = anime

**jape** /dʒeɪp/ *noun*
فێڵ، تەڵەکە، گاڵتە، گاڵتەجاڕی، گەپ، شۆخی ◌ حقه، مسخرگی، شوخی

**Japhet** *noun*, Latin *Japheth* or Greek *Iapheth*, from Hebrew *Yepheth*
یافێت، یافێس، یافس، یافێس: کوڕی پێغەمبەر نووح کە ڕەچەڵەکی هێند و ئەورووپایی دەچێتەوە سەر ئەو (یان سەرڕەچەڵەکی میدی و یونانی‌یەکان) ◌ یافث

**Japhetic** /dʒəˈfetɪk/ *adjective*
1 یافێتی، یافێسی 2 هێند و ئەورووپایی ◌ 1 یافثی 2 هند و اروپایی

**Japlish** /ˈdʒaplɪʃ/ *noun*
ژاپلیسی (ژاپۆنی + ئینگلیسی): تێکەڵەیێ لە ئینگلیسی و ژاپۆنی کە لە ژاپۆن قسەی پێ دەکرێ ◌ ژاپلیش

**japonica** /dʒəˈpɒnɪkə, US -ˈpɑːn-/ *noun*
کوخی ژاپۆنی بەهێی ژاپۆنی [*Chaenomeles speciosa* (Japanese quince)] و جـــۆرە پێوەندی‌دارەکان] ◌ به ژاپنی

**jar**[1] /dʒɑː(r)/ *noun*
مەرکانە، کووپە، گۆزە، گۆزەڵە، کووزەڵە، کووزە، جەڕە، شووشە بیرە، لیوانی ناووجۆ، پارچ، شووشەی دەم‌گەورە (بنەڕەت: لە *jarred* فەڕەنسی، لە *jarra* عەرەبی‌یەوە) ◌ بانکه، بلونی، سبو، شیشەی آبجو

**jar**[2] /dʒɑː(r)/ *noun*
1 دەنگی ناخۆش، کڕە 2 لێک‌کەوتن، پێکاکەوتن، گورز، لێدان، داتروسکان، داخورپان، داچڵەکان، ڕاتڵەکان، لەرینەوە 3 شەڕ، قڕە، جووڕە، کێشە، شەڕوهەنگامە، ناکۆکی، دژایەتی، نەسازاوی، نەسازان ◌ 1 صدای گوش‌خراش 2 برخورد، صدمه، ضربه، تکان، ارتعاش 3 نزاع، مرافعه، مخالفت، ناسازگاری

**jar**[3] = ajar

**jardinière** /ˌʒɑːdɪnˈjɛː/ *noun*
گوڵدانێکی جوانی کە گوڵ و گیای تیایە ◌ جاردین

**jargon**[1] /ˈdʒɑːgən, US ˈdʒɑːrgən/ *noun*
1 زمان تکنیکی و تایبەتی (کۆمەڵێ) 2 وشە یا دەستەوشەیەکی تایبەتی 3 زمانی پیشەیی 4 زمانی لێ‌تێنەگەیشتوو یان تێکەڵ‌وپێکەڵ ◌ 1 زبان فنی و خاص گروهی 2 واژه یا عبارت ویژه 3 زبان حرفه‌ای 4 زبان نامفهوم

**jargon**[2] /ˈdʒɑːg(ə)n/ *noun*, also jargoon /dʒɑːˈguːn/
جارگۆن، جۆرێ زیرکۆن ◌ زرگون

**jargonic** *adjective*
لێ‌تێنەگەیشتوو، تێکەڵ‌وپێکەڵ ◌ غیرمفهوم

**jargonist** *noun*
ژارگۆنیست، جارگۆنیست (= کەسێ کە بەو زمانە قسە دەکا) ◌ جارگونیست

**jarl** /jɑːl/ *noun*
(مێژوویی، نۆرویژی و دانمارکی) سەرۆک ◌ رئیس

**Jarlsberg** /ˈjɑːlzbəːg/ *noun*
پەنیرێکی نەرم و توندی نۆرویژی ◌ جارلزبرگ

**jarrah** /ˈdʒarə/ *noun*
دارکافووری ئەوستڕالیایی (ڕەسەنی ڕۆژاوای ئەوستڕالیا [*Eucalyptus marginata*]) ◌ جاراه

**jarring** *adjective*
1 کپرە، ناخۆش، کڕە 2 ناجۆر، دژ، یەک‌نەکەوتوو ◌ 1 گوش‌خراش 2 مخالف

**jasmine** /ˈdʒæzmɪn/ *noun*, also jessamine
یاسەمین، یاسەمەن [*Jasminum nudiflorum* (هی زستانی، چین)، *Gelsemium sempervirens* (هی هاوینی، ئەمریکا)] ◌ یاسمن

**jasmine tea** *noun*
چایی یاسەمین یان یاسەمەن ◌ چای یاسمن

**Jason** *noun*
جەیسۆن (پاڵەوانی ئەفسانەیی یونانی کە توانی خوری یا کەوڵی زێڕین بەدەس بێنێ) ◌ جیسون

**jasper** /ˈdʒæspə(r)/ *noun*
ژاسپ، جەسپێر، دانە (بەردێکی بەنرخ) ◌ ژاسب، یشم

**jaspery** *adjective*
ژاسپی، جەسپیری ◌ ژاسبی
**Jat** /dʒɑ:t/ *noun*
ئەندامی گەلێ کە لە سەرتاسەری باکووری ڕۆژاوای نیمچەوشکاری هیند بڵاوبوونەتەوە ◌ جات
**jati** /'dʒɑ:ti/ *noun, pl.* same or jatis
(هیندی) چین یان لاچین (بنەڕەت: لە *jāti* سانسکریتی "birth") ◌ کاست
**jaundice** /'dʒɔ:ndɪs/ *noun*
1 زەردوویی، بەزەک 2 ڕق و کینە گێران، کینەگێری، ڕقلێسووان ◌ 1 یرقان 2 غرض‌ورزی
**jaundiced** /'dʒɔ:ndɪst/ *adjective*
1 زەردوویی‌گرتوو، زەردەڵ، تووش‌بوو بە زەردوویی 2 کینەگێرانە، ڕەشبینانە ◌ 1 مبتلا بە یرقان 2 غرض‌آلود، غرض‌آلود
**jaunt** /dʒɔ:nt/ *noun*
گەڕان، گەشت، سەردان (کورت و بۆ خۆشی)، excursion ◌ گردش
**jauntily** /'dʒɔ:ntɪli/ *adverb*
سەرخۆشانە، بە کەیفەوە ◌ با نشاط
**jauntiness** /'dʒɔ:ntinəs/ *noun*
سەرخۆشی، بەکەیفی، خۆشی، شادی، بەدەماخی ◌ نشاط، سرزندگی
**jaunty** /'dʒɔ:nti/ *adjective* (jauntier, jauntiest)
سەرخۆش، بەکەیف، شاد، بەدەماخ، دڵخۆش، لەگەش، بەگوڕ، لەجۆش: *a hat set at a jaunty angle* ◌ سرزنده، بانشاط
**Java** /'dʒæsə/ *noun*
(دروشمی بازرگانی) جاڤا (زمانێکی کامپیوتیری کە بە تایبەت بۆ نووسینی بەرنامەی ئینتێرنێت بەکاردێنرێ) ◌ جاوا
**java** /'dʒæsə/ *noun*
(لە ئەمریکا و نافەرمی) قاوە ◌ قهوه
**Javan** /'dʒɑ:vən/ *noun, adjective*
*n* خەڵکی دوورگەی جاڤا، جاڤایی *adj* جاڤایی ◌ جاوەای
**Javanese** /ˌdʒɑ:və'ni:z/ *noun, adjective, pl.* same
*n* 1 زمانی جاڤایی (زمانی ئیندۆنیزیای ناوەندی جاڤا) 2 خەڵکی جاڤا *adj* جاڤایی ◌ *n* 1 زبان جاوەای 2 اهل جاوە *adj* جاوەای
**java sparrow** *noun*
چۆلەکەی جاڤایی [*Padda oryzivora*] ◌ گنجشک جاوەای
**javelin** /'dʒævlɪn/ *noun*
1 وەرزش یان پێشبڕکێی ڕماوێژی، جریتێن 2 جریت، تیر، ڕم، خشت، هوویزی، نێزە، نەیزە ◌ 1 ورزش یا مسابقەی پرتاب نیزە 2 نیزە
**javelina** /ˌhavə'li:nə/ = peccary

**javelineer** /dʒævlɪ'ni:(r)/ *noun*
ڕمدار، ڕمبەدەست، تیربەدەست، نێزەبەدەست، نەیزەوان، نەیزەدار، تیردار، خشت‌بەدەست ◌ نیزدار
**Javelle water** *noun*
ئاوی ژاڤێل: گیراوەیێکی ئاوی هایپۆکلۆریتی سۆدیۆم، وەک کەرەسەی ڕەنگ‌بەر یان پاکژکەرەوە بەکاردێنرێ ◌ آب ژاول
**jaw** /dʒɔ:/ *noun*
1 شەویلکە، کازێر، چەناگە 2 زۆربڵەیی، چەنەدرێژی، چەقەسرۆیی 3 لایەکی گیرە 4 (jaws) (گیانەوەر) دەم، زار 5 گیرە 6 دەمی تەنگ و باریکی دۆڵ، کاناڵ و هتد 7 (خوازە) چنگ ◌ 1 آرواره، فک، چانە 2 وراجی 3 یک طرف گیره 4 (در جمع) دهان 5 گیره 6 دهانەی باریک دره، کانال و غیره 7 پنجه
**jawbone** /'dʒɔ:bəʊn, US -boʊn/ *noun*
ئێسکی شەویلکە یان کازێر ◌ استخوان آرواره
**jawbreaker** /'dʒɔ:breɪkə(r)/ *noun*
1 وشەی گۆگران، وشەیێ کە گۆکردنی گران بێ 2 شیرینی ڕەق، شیرینی شەویلکەداخەر، نوقڵی ڕەق ◌ 1 جاوبریکر 2 شیرینی سفت
**jaw-dropping** *adjective*
(نافەرمی) سەرسووڕهێنەر، سەیر ◌ شگفت‌آور
**jaw-droppingly** *adverb*
سەرسووڕهێنەرانە، (بە شێوەیەکی) سەیر ◌ بە طور شگفت‌آور
**jawline** *noun*
هێڵی ژێر چەناگە ◌ خط زیر چانە
**jay** /dʒeɪ/ *noun*
1 (باڵندە) بۆرەک، قژاوکە [*Garrulus glandarius*] (ئۆراسیا) و جۆرەکانی تر] 2 = prattler ◌ جی‌جاغ
**jaybird** = jay 1
**Jaycee** /dʒeɪ'si:/ *noun*
ئەندامی پایەنزمی ژووری کارداری یان بازرگانی ◌ جیسی
**jayvee** *noun*
ئەندامی تازەکاری تیپ یان دەستەیێکی وەرزشی ◌ جای‌وی
**jaywalker** *noun*
پیادەڕۆی بێ‌سەرنج یان ئالۆری، مەرەگێژە، پیاتیپەڕی کەمتەرخەم، تیپەڕیوی خۆپیاکردوو ◌ عابر بی‌توجه
**jaywalking** *noun*
پەڕینەوەی بێ‌سەرنجانە، (پیا)تیپەڕینی کەمتەرخەمانە، پەڕینەوەی مەترسی‌دارانە یان سەرەڕۆیانە ◌ عبور بدون توجه
**jazz** /dʒæz/ *noun*
1 (موسیقی) جاز (هی ڕەشەکانی ئەفریکا، بە سازی زەرد و بایی دارین) 2 هەڵیت‌وپلیت،

قسەی هیچەکە یا قۆڕ ۞ 1 جاز 2 چرت و پرت

**jazz age** *noun*
سەردەمی جاز (بیستەکان لە ئەمریکا، سەردەمی ئازادی، خۆشی و زەبەنی) ۞ دوران جاز

**jazz band** /'dʒæz bænd/ *noun*
تیپی جاز ۞ گروه جاز

**jazzbo** *noun, pl.* jazzbos
(نافەرمی) موسیقاژەن یان بەپەرۆشی جاز ۞ جازبو

**jazzed** *adjective*
(لە ئەمریکا) ورووژاو ۞ هیجانزده

**jazzercise** /'dʒæzəsaɪz, US -zərs-/ *noun*
جازێرسایز، جەزێرسایز (شێوەیێ ئێرۆبیک کە جوولە و مەشقی لە سەمای جاز وەرگرتووە) ۞ جازرسایز

**jazzy** /'dʒæzi/ *adjective* (jazzier, jazziest)
1 جازی، جازئاسا، شێوە جاز 2 بەزریقەوبریقە، ڕەنگاوڕەنگ، بەناڵاووالا ۞ 1 وابسته بە جاز، جازمانند 2 پرزرق و برق

**JCB** /ˌdʒeɪ siː 'biː/ *noun*
جێی‌سی‌بی (= ماشینێکی بەهێز بۆ هەڵکەندنی عەرز؛ بنەڕەت: سەرەتای *J. C. Bamford* سازەرانی) ۞ جی‌سی‌بی

**jealous** /'dʒeləs/ *adjective*
1 بەئیرەیی، بەخیل، بەخیلانە، لە ڕووی بەخیلی(یەوە): *2 a jealous wife/husband* ئاگادار، چاوبەسەرەوەبوو، ئاگالێبوو: *new colonies were jealous of their new 3 independence* — Scott Buchanan بەپەرۆش، بەغیرەت ۞ 1 حسود، حسودانه 2 مراقب 3 غیور

**jealously** /'dʒeləsli/ *adverb*
لە ڕووی ئیرەیی(یەوە)، بەخیلانە: *She eyed Natalia jealously* ۞ حسودانه

**jealousy** /'dʒeləsi/ *noun*, also jealousness
1 ئیرەیی، چاوپێ‌هەڵنەهاتن، بەخیلی: *sexual 2 I felt sick with jealousy ◊ jealousy* چاوبەسەرەوەبوون، ئاگاداری (بەپەرۆشی zealous)، ئاگالێبوون، بەپەرۆشی، غیرەت ۞ 1 حسادت 2 مراقبت، غیوری

**jeans** /dʒiːnz/ *noun, pl.*
شەلواری لی یان جین (بنەڕەت: لە Janne ناوی فەرەنسی کۆن بۆ Genoa، شوێنی سەرەتا بەرهەمهاتنی) ۞ شلوار جین

**jebel** /'dʒɛbɛl/ *noun*
(لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و باکووری ئەفریکا) چیا، کێو، شاخ، گرد، زورگ، زنجیرەتەپ (لە *jabal*ی عەرەبی) ۞ جبل، کوه، تپه، رشته تپه

**jeep** /dʒiːp/ *noun*
جیپ (شەڕی جیهانی دووەم، لە بنەڕەتا هی ئەمریکا، GP لە سەرەتای دوو وشەی general purpose پێکهاتووە) ۞ جیپ

**jeer** /dʒɪə(r), US dʒɪr/ *noun*
تیتاڵی، گاڵتە، شۆخی، تانە، تەشەر، توانج، پلار ۞ تمسخر، طعنه

**jeera** /'dʒiːrə/, also zeera /'ʒiːrə/ = Indian term for cumin

**jeerer** *noun*
تیتاڵی‌پێکەر، شۆخی‌باز، تیزێکەر ۞ مسخره‌کننده

**jeeringly** *adverb*
بە گاڵتەوە ۞ با تمسخر

**jeet kune do** /'dʒiːt kuːn duː/ *noun*
جیت کان دۆ (تێکەڵەیێ لە کونگ‌فو، شمشێرەوانی و شەڕەمشت، لە لایەن بروس لی Bruce Lee (1941–73) یەوە داهێنرا، بە واتای "شێوەی گێڕانەوەی مشت") ۞ جیت کان دو

**jehad** = jihad

**Jehoshapat** *noun*, Hebrew *Yĕhōshāphāṭ*
یەهوشافات: پادشای یەهوودا Judah لە سەدەی نۆیەمی بەرلە زایین (لە سەردەمی یەهوشافاتدا یەهوودا لەگەڵ شانشینی باکووری ئیسرائیل یەکیان گرت) ۞ یهوشافاط

**Jehovah** /dʒɪ'həʊvə, US -'hoʊ-/ *noun*
یەهووە (= ناوی خودا لە کتێبی پەیمانی کۆندا) ۞ یهوه

**Jehovah's Witnesses** *noun, pl.*
شایەدان یا ستووفدەرانی یەهووە، گەواهی‌دەران یا ئاگاوانانی یەهووە (ئەندامانی ڕێکخراوەیەکی دینی کە باوەڕیان وایە کە کۆتایی جیهان نزیکە و خودا هەموو کەسێ دەگری بێجگەلە ئەندامانی خۆی نەبێ) ۞ گواهان یا شاهدان یهوه

**Jehu** *noun, Hebrew Yēhū*
1 یەهو(و): پادشای گەلی ئیسرائیل لە سەدەی نۆیەمی بەرلە زایین 2 کالیسکەوان، عەرەبانەوان (ب.ت. بێباک) ۞ 1 ییهو 2 درشکه‌ران

**jejunal** /dʒɪ'dʒuːnəl/ *adjective*
سەربە بۆشەڕیخۆڵە، بۆشەڕیخۆڵەیی ۞ وابسته به روده‌ی تهی

**jejune** /dʒɪ'dʒuːn/ *adjective*
ماندووکەر، وەڕەس‌کەر، جاڕس‌کەر، بێ‌تام، قۆڕ، ناسەرنج‌ڕاکێش، هیچەکە، مناڵانە، ساویلکانە ۞ خسته‌کننده، کودکانه، ساده‌لوحانه

**jejuneness** /dʒɪ'dʒuːnnəs/ *noun*
ماندووکەری، وەڕەس‌کەری، ناخۆشی، جاڕس‌کەری، مناڵانەبوون، ساویلکەیی ۞ ملال‌آوری، کودکانه بودن

**jejunum** /dʒɪ'dʒuːnəm/ *noun, pl.* jejunua
(توێکاری) بۆشەڕیخۆڵە، پووچەڕیخۆڵە: بەشی نێوەڕاستی ڕیخۆڵە چکۆڵە small intestine، نێوان duodenum و ileum ۞ روده‌ی تهی

**Jekyll and Hyde** /ˌdʒekl ən 'haɪd/ *noun*
مرۆڤی دووکەسیتی (یەکیان چاک Jekyll و

ئەوی تریان خراپ Hyde) ◯ جکل و هاید

**jellaba** = djellaba

**jellied** /'dʒelid/ *adjective*

ژلەدار، ولولەدار، ژێلەیی، ولولەیی، ولولەئاسا، شێوەولولە، دەلمەئاسا ◯ ژلەدار، ژلەمانند

**jello** *noun*, also trademark Jell-O

دیسێری ولولەیی میوەیی ◯ دسر ژلاتینی میوەای

**jelly** /'dʒeli/ *noun, pl.* jellies

1 ولولـە، ژلـە، دەلـمە 2 مرەبـا، رەچـەڵ 3 – gelignite ◯ 1 ژله 2 مربا

**jelly baby** *noun*

ژێلی بەیبی: شیرینییەکی بە شێوەی منداڵ، لە ژێلاتین ساز دەبێ ◯ جلی‌بیبی

**jelly bean** *noun*

جێلی‌بین ◯ جلی‌بین

**jellyfish** /'dʒelifɪʃ/ *noun, pl.* same or jellyfishes

1 ماسـی نەرمەلیقـە، بـووکی دەریـایی، چـەتری دەریـایی، بـووکی ولولـەیی [پۆلـەکـانی Scyphozoa و Cubozoa] 2 مـرۆڤ یـان کەسێکی دەستەوسان، بەیدەس، ترەبۆزە ◯ 1 عروس دریایی 2 آدم ضعیف‌الشخصیه

**jelly roll** *noun*, also Swiss roll

(شیرینی) رولێت ◯ رولت

**jelly shoe** *noun*, also jelly sandal

سەرپایی ولولەیی ◯ صندل ژله‌ای

**jelutong** /dʒɛ'lu:tɒŋ/ *noun*

(رووەکناسی) درەختێکی مالیزیایی کە دارێکی پەمەیی سووکی هەیە [تۆخم *Dyera*: چەندین جۆرن] ◯ جلوتانگ

**jemmy** /'dʒemi/ *noun, pl.* jemmies

نێل، لۆسە، باری، بەرازە، مەلغە، نوێل، لەوازە (کورت) ◯ دیلم

**je ne sais quoi** /ˌʒə nə seɪ 'kwɑ:/ *noun*

(فەرەنسی) باشی لەباسنەهاتوو یان شتێکی لەباسنەهاتوو (واتای خۆی: نازانم چی) ◯ کیفیت غیرقابل بحث

**jenny** /'dʒeni/ *noun, adjective, pl.* jennies

*n* 1 (جاران) دەزگای رستن، خەرەک، دوکەک، دولاب 2 ماکەر، ماچە *adj* (باڵندە) مێ ◯ *n* 1 ماشین نخ‌ریسی 2 ماده الاغ *adj* ماده

**jenny ass** *noun*

ماکەر، ماچە ◯ ماده الاغ

**jenny wren** = wren

**jeon** /dʒʌn/ *noun, pl.* same

یەکەی پارەی کۆریای باشووری، بەرامبەر بە سەدیەکی won ◯ ینون

**jeopardous** /'dʒepədəs/ *adjective*

مەترساوی، مەترسیدار ◯ مخاطره‌آمیز

**jeopardy** /'dʒepədi, US -pərdi/ *noun*

1 مەترسی 2 (ماف) مەترسی تاوانبارکردن لە دادگادا، کێشەی قانوونی ◯ 1 مخاطره 2 مسألهی حقوقی

**Jer.** *abbreviation* Jeremiah (in biblical references

**jerboa** /dʒɜ:'bəʊə, US dʒɜ:r'boʊə/ *noun*

مشکەدوویی، مشک کەروێشک، مشکەپەڕیو (ئاسیا و ئەفریکای باکووری [خێزانی Dipodidae، چەندین جۆرن]؛ بنەڕەت: لە عەرەبی *yarbū'*) ◯ کلاک‌موش

**jeremiad** /ˌdʒerɪ'maɪæd/ *noun*

1 گلەیی و گازندە، سکاڵا، ئاهـ و ناڵە، شکات، بەدشانسی، نەهاتی، ناوچاوانهێنان، بەختڕەشی، سەردولکە، چەمەری، شینوشەپۆر، گابۆر، رۆڕۆ 2 شین‌نامە (ئاماژە بە شینی ئەرمیا لە پەیمانی کۆندا Old Testament) ◯ 1 شکوه و شکایت، بداقبالی، مرثیه، گریه و زاری 2 سوگ‌نامه

**Jeremiah** /ˌdʒɛrɪ'mʌɪə/ *noun*, also Jeremias, from Hebrew *Yirmĕyāh*

1 یەرمیا(هـ)، ئەرمیا: گەورە پێغەمبەرێکی گەلی ئیسرائیلی سەدەکانی حەوت و شەشی بەرلە زایین 2 کتێبی ئەرمیای پێغەمبەر 3 دەمبەگلەیی، بەگلەیی‌وگناشت ◯ 1 ارمیا 2 کتاب ارمیای نبی 3 شکوه‌کننده

**jerk** /dʒɜ:k, US dʒɜ:rk/ *noun*

1 (تونـد) تەکان، راتـلەکان، راتەکان، پـاڵ، راوەشـان، لەقانـدن 2 (لەش) فـڕین، فرتـە 3 بنیادەمی کەر ◯ 1 تکان 2 پرش 3 آدم احمق

**jerkily** /-ɪli/ *adverb*

بە هەڵبەزدابەز، بە تەکان‌تەکان، تەکان‌تەکان: *The car moved off -ily* ◯ جست و خیزکنان

**jerkin** /'dʒɜ:kɪn, US 'dʒɜ:rkɪn/ *noun*

1 سیخمەی درێژ، جلی(س)قەی درێژ 2 کۆتی چەرمی تەنگی پیاوان ◯ 1 جرکین 2 نیم‌تنەی چرمی مردان

**jerkiness** /'dʒɜ:kinəs, US 'dʒɜ:rkinəs/ *noun*

گەوجێتی، کەرێتی ◯ نفهمی

**jerky**[1] /'dʒɜ:ki, US 'dʒɜ:rki/ *adjective* (jerkier, jerkiest)

پچڕپچڕ، نارێک، تەکان‌تەکان، پڕهەڵبەزودابەز، پڕتەکان، تەکاناوی، گەوج، کەر ◯ منقطع، پرتکان، نامنظم، احمق

**jerky**[2] /'dʒɜ:ki, US 'dʒɜ:rki/ *noun*, also jerked meat

(گۆشت) توێ‌توێ‌کراو و وشکەوەکراو: *beef jerky* ◯ جرکی

**jeroboam** /ˌdʒerə'bəʊəm, US -'boʊ-/ *noun*

شووشەمەیێکی گەورە بە ئەندازەی 4/5 گالۆن (بنەڕەت: لە ناوی *Jeroboam* پادشایێکی

ئیسرائیل (باکووری فەلەستین) ۞ بطری بزرگ

**Jerry** /ˈdʒeri/ *noun, pl.* Jerries

(بریتانیا و نافەرمی) ئالمانی یان ئالمانییەکان، سەربازی ئالمانی ۞ آلمانی یا آلمانی‌ها، سرباز آلمانی

**jerry** /ˈdʒeri/ *noun, pl.* jerries

لەگەن، جیٚمیز، کاسەمیز، میزدان ۞ ظرف ادرار

**jerry-builder** *noun*

سازوفرۆشیار ۞ بساز و بفروش

**jerry-building** *noun*

سازوفرۆشی، سازوفرۆش ۞ بساز و بفروشی

**jerry-built** /ˈdʒeri bɪlt/ *noun*

رووخەک، بەترپەند، ترەکەلەک، سست، لەق، ناپتەو، سازوفرۆشی ۞ نامحکم، بساز و بفروشی

**jerrycan** /ˈdʒerikæn/ *noun,* also jerrican

جێریکەن، گالۆن (بۆ هەلگرتن یان بردنی شلەمەنی، ب.ت. ئاو و نەوت و بێنزین) ۞ گالن

**jersey** /ˈdʒɜːzi, US ˈdʒɜːrzi/ *noun, pl.* jerseys

1 بلوز (لە خوری)، جۆرێ پارچە، جێرزی، پولیڤێر، ژێرکراسی کەژی یان کێشی، فانیلە 2 (Jersey) جێرزی (= جۆرێ مانگای شیری لە رەگەزی رەسەن) ۞ 1 بلوز، تریکو، پولیور 2 (با J) جرزی

**jersey-wool** *noun*

جێرزی لە خوری ۞ تریکو پشمی

**Jerusalem artichoke** *noun*

سێوی بنەرز، پەلەکباخی، سێبنەرد، سێبنهەرد، پەلووکباغی، سەوزەیەکی قاوەیی رۆشنی شێوەپەتاتە، وەک سەوزە دەخورێ [*Helianthus tuberosus*] ۞ سیب‌زمینی ترشی

**Jerusalem cherry** *noun*

جۆرێ رووەکی جیهانی کۆن، لە خێزانی nightshade بە گولی سپی و بەری گێلاسییەوە [*Solanum pseudocapsicum*] ۞ نوعی گیلاس

**Jerusalem cricket** *noun*

جۆرێ سیسرکی قاوەیی سوورباو، هی ناوچە وشکەکانی رۆژاوای ئەمریکای باکووری [*Stenopelmatus fuscus*] ۞ نوعی جیرجیرک

**Jerusalem oak** *noun*

سەوزەگیواو، گیاسەوزە ۞ درمنەی ترکی، سلمک اورشلیمی

**Jerusalem sage** *noun*

(رووەکناسی) حەشەلوورە، کاسەشۆر، کورەگۆشە ۞ فتیله‌ای

**Jerusalem thorn** *noun*

1 = Christ's-thorn 2 جۆرێ داری درکاوی گەرمێنانی ئەمریکا، لە خێزانی legume [*Parkinsonia aculeata*] ۞ نوعی درخت

**jess** /dʒɒs/ *noun*

پاوانەی باز، پێبەند یان پێوەندی واشۆ یان هەلۆ (ئالقەپێکیشی پێوەیە) ۞ پاچەبند قوش

**jessamine** /ˈdʒesəmɪn/ = jasmine

**Jesse** /ˈdʒesi/ *noun,* Hebrew *Yishay*

جێسی، یەسا، یێسی، یەسی: باوکی داوود، پادشای ئیسرائیل ۞ یَسّا

**jest** /dʒest/ *noun*

شۆخی، جەفەنگ، حەنەک، مایەی پێکەنینی، بەزم، قۆشمە، تیز، گالتە ۞ مزاح، شوخی، مضحکه، ریشخند

**jester** /ˈdʒestə(r)/ *noun*

قۆشمە، گالتەبێژ، شۆخیباز، قسەخۆش، حەنەکچی ۞ آدم بذله‌گو

**Jesuit** /ˈdʒezjuɪt, US ˈdʒeʒəwət/ *noun*

1 ئەندامی کۆمەلەی Jesus (عیسا)، گرووپێکی ئایینی کاتۆلیکی رۆمانی 2 مرۆی فێلاوی، بنیادەمی تەلەکەباز، فریودەر، ریاییباز، دوورروو ۞ 1 یسوعی 2 آدم فریبکار، مزور

**Jesuitical** *adjective*

فریودەرانە، ریاییبازانە، دوورووانە، تەلەکەبازانە، فێلاوییانە ۞ مزورانه، حیله‌گرانه

**Jesus** /ˈdʒiːzəs/ = Christ

**jet**[1] /dʒet/ *noun*

1 فرۆکەی تەکاندەر یان جێت 2 کوفارە، فیشقە، فیچقە، فیشقاو، پیت 3 کون، شیر، سەرلوولە، دەم، زار ۞ 1 هواپیمای جت 2 فواره 3 سوراخ، شیر

**jet**[2] /dʒet/ *noun*

شەوە، کارەبای رەش ۞ کهربای سیاه

**jet aircraft** = jet plane

**jet-black** /ˈdʒet ˈblæk/ *adjective*

رەشی شەوەیی، وەک قەترانی رەش ۞ سیاه براق

**jet engine** *noun*

بزوێنە یان مۆتۆری جێت ۞ موتور جت

**jetfoil** /ˈdʒetfɔɪl/ *noun*

جێتفۆیل، بەلەمەفڕیو ۞ قایق پرنده

**Jethro** *noun*

خەزووری مووسای پێغەمبەر Ex. 3:1. ۞ پدرزن موسی

**jet lag** *noun*

ماندوویی فڕین، جێتبردوویی، ماندوویی ریگا ۞ خستگی پرواز

**jet-lagged** *adjective*

ماندووبووی فڕین، ماندووی ریگا، جێتبردوو ۞ دچار خستگی پرواز

**jetliner** *noun*

فرۆکەی جێتی گەورەی سوارهەلگر ۞ جت‌لاینر

**jet plane** *noun*

فرۆکەی تەکاندەر، فرۆکەی جێت ۞ هواپیمای جت

ســەرەتا، شــوێنی دەســپێک(ردن)، دەســپێک: *Delhi is the best jumping-off point for a trip to India* ۞ نقطەی شروع

**jumping plant louse** *noun*
ئەسپێی بازدەری(یا پەڕۆک) رووەک، خێزانی Psyllidae ۞ نوعی شپش

**jumping sheet** *noun*
پارچەی بازدان (لە کاتی ئاورگرتنی جێگایێ، لەوێوە بۆ نێو ئەو پارچەیە خۆ فڕێدەدەن) ۞ جامپینگ شیت

**jumping spider** *noun*
جالجالــووکەی بــازدەر یــا پــەڕۆک، خێــزانی Salticidae ۞ نوعی عنکبوت

**jump jet** *noun*
فڕۆکــەی ســتوونیفــڕیو، فڕۆکــەی راســتەفڕ ۞ هواپیمای عمود پرواز

**jump-lead** /ˈdʒʌmp liːd/ *noun*
(پڕکردنەوەی باتری ماشێن) وایەری بەستەر ۞ سیم کتاکت

**jumpmaster** *noun*
چاودێری چەتربازەکان ۞ جامپ‌ماستر

**jump-off** *noun*
(ئەسپ‌سواری) بازی زیادی، پەڕینی زیادی ۞ پرش اضافه

**jump rope** *noun*
(کایەی منالان) تەناف، پەت ۞ طناب

**jump seat** *noun*
سەندەڵی یان کورسی کووەبوو، سەندەڵی زیادی ۞ صندلی تاشو

**jump shot** *noun*
(یاری تۆپی سەبەتە) خستن یان شووتی بازدان ۞ شوت پرشی

**jump-start** *noun*
(ماشێن) هەڵکردن بە پاڵ ۞ روشن کردن با هل

**jumpsuit** /ˈdʒʌmpsuːt, US -sjuːt/ *noun*
جل یان بەرگی یەکسەرە، بالاپۆش ۞ روپوش، لباس سرهمی

**jump-up** *noun*
هەڵــبەرکێ یــان رێورەســمی کــارائیبی یــان کاریبیەن ۞ رقص یا مراسم کاریبیان

**jumpy** /ˈdʒʌmpi/ *adjective* (jumpier, jumpiest)
نگەران، دڵلەدوا، ئارامڵێ‌هەڵگیراو، بێ‌ئۆقرە، تاولــێ‌هــەڵگیراو، نائــارام، شــڵەژاو، تێکچــوو، هــەژیو، jittery ,nervous ۞ نگــران، عــصبی، بی‌تاب

**Jun** *abbreviation* 1 June 2 Junior
2 (لە ئــەمریکا، بــە دوای نــاوی تایبــەت‌دا دێ) کوڕ، چکۆلە ۞ 2 پسر

**jun** /dʒʌn/ *noun, pl.* same
یەکــەی پــارەی کۆریــای بــاکووری بەرامبــەر بــە سەدیەکی won ۞ پسر

**junco** /ˈdʒʌŋkəʊ/ *noun, pl.* junco or juncoes
لەوەنـە: سەیرەی ئەمریکای باکووری [تـوخم *Junco*: چەندین جۆرن] (بنەڕەت: لە *juncos* ی لاتین "reed" یان لەوەن") ۞ سـهرەی امریکـای شمالی

**junction** /ˈdʒʌŋkʃn/ *noun*
1 پێــک‌بەســتن، پێکەوەلکانــدن، یــەک‌خــستن، پێک‌گەیانـدن، پێـک‌بەستراوی، پێوەسـت‌بـوون، لکــین، پێــک‌بەســتران، پێــک‌گەیــشتن، لێــک‌گــرێ‌دران، یــەک‌گــرتن 2 شــوێنی پێکەوەبەســــتران، جەمــــسەر، شــــوێنی پێـک‌گەیـشتنەوە یـا لـق‌لێبوونــەوە، پێوەســتگا، یەکتربڕین: *the junction between nerves and muscles* 3 دوڕیانـە، چـوارڕێیانـە ۞ 1 اتصال، الحاق 2 ملتقی، محل اتصال 3 تقاطع

**junctional** *adjective*
پێک بەستنەوەیی ۞ اتصالی

**junction box** *noun*
قوتوی بەستنەوە(ی وایەرە ئێلیکتریکی‌یەکان) ۞ جعبە تقسیم

**juncture** /ˈdʒʌŋktʃə(r)/ *noun*
1 پێـک‌بەسـتن، پێـک‌بەسـتراوی، جـووت‌بـوون، پێوەست‌بـوون، پێـک‌بەسـتران، لێـک‌گـرێ‌دران، یەک‌گرتن 2 شوێنی پێکەوەبەستران، جەمسەر، شوێنی پێوەست(بوون)، شوێنی پێک‌گەیشتنەوە یان لق‌لێبوونەوە، پێوەستگا 3 رەوشـی تایبـەتی، هـەلومـەرجی تایبـەتی، بـارودۆخی نـاسـک یـا ئاسـتەم 4 بـارودۆخ، کـاودان، رەوش، قۆنـاخ، سـەروبەند، کـات ۞ 1 اتـصال 2 محـل اتـصال، برخوردگاه 3 موقعیت ویژە 4 وضع، برهه، لحظه

**June** /dʒuːn/ *noun*
ژوون، حــەزیران، ژوونــەن، ژووەن، جــۆزەردان، بارانبڕان (شەشەمین مانگی ساڵی زایینی نێوان May و July لـە *Junius (mensis)* لاتـینی "(مانگی) June") ۞ ژوئن

**juneberry** *noun, pl.* juneberries
دەوەنێکــی ئــەمریکای بــاکووری لــە تــیرەی گوڵــەباخ [تـوخم *Amelanchier*: زۆر جـۆری هەیە] ۞ ژونبری

**June bug** /ˈdʒuːn bʌɡ/ *noun*
(زۆتر لە ئەمریکا) chafer ێ شێوەی قالۆنچە دەدا کە زۆرتر لە مانگی جۆزەردانا هەڵـەفڕێ، سنی جۆزەردان ۞ نوعی سوسک

**Jungian** /ˈjʊŋɪən/ *adjective, noun*
*adj* ســـەربە کـــارل یونـــگ (1875-1961)، دەروونناسی سویسی یان سیستمی دەروونناسـی شــی‌کردنــەوەیی *n* لایــەنگری یونــگ یــان دەروونناسی‌یەکەی ۞ *adj* وابسته بـه یونـگ *n* پیرو کارل یونگ

**jungle** /ˈdʒʌŋgl/ *noun*
1 دارستان، نزار، دەحل، بێشەلان، جەنگەڵ، جەنگەڵستان 2 شوێنی ململانێ 3 ڕەوشی ئالۆز، کاودانی شێواو یان شپرزە، باروودۆخی تێکچوو ◌ 1 جنگل 2 محل نزاع 3 وضعیت آشفته
**jungle fever** /ˈdʒʌŋgl ˈfiːvə(r)/ *noun*
تای دارستان، جۆرێ سەختی لەرزوتا malaria ◌ تب جنگلی
**junglefowl** *noun, pl.* same
جۆرێ باڵندەی باشووری ئاسیا [*Gallus gallus* و جۆرەکانی تر] ◌ نوعی پرندەی شکاری
**jungle gym** = climbing frame
**jungly** *adjective*
دارستانی، دارستان‌ئاسا، جەنگەڵ‌ئاسا، جەنگەڵی ◌ جنگلی، جنگل‌مانند
**junior** /ˈdʒuːniə(r)/ *adjective, noun*
*adj* منداڵتر، چکۆلانەتر، چکۆلە، بچووک، چکۆلەتر، خوارتر، کەمتر، نزمتر، خواردەس، ژێردەس، پایەنزم، (قوتابی یان خوێندکار) ساڵی سێیەم *n* 1 (ڕێکخراوە یان کاری) مرۆ یان بنیادەمی پایەنزم 2 فەرمانبەری خواردەس یان پایەنزم 3 (لە ئەمریکا) خوێندکاری ساڵی سێیەم، (لە ئەمریکا) قوتابی یان خوێندکاری ساڵی سێیەمی دواناوەندی 4 منداڵی خوێندنگای سەرەتایی ◌ *adj* کوچک، کوچک‌تر، پایین‌تر، دون‌پایە، سال سوم *n* 1 آدم دون‌پایە 2 کارمند جزء 3 (امریکا) دانشجوی سال سوم، (امریکا) دانش‌آموز سال سوم دبیرستان 4 بچەی دبستانی
**Junior** /ˈdʒuːniə(r)/ *noun*
(لە ئەمریکا، بە دوای ناوی تایبەتدا یان کوڕ و باوک نێوێکیان هەبێ) کوڕ، چکۆلە ◌ پسر، کوچک
**Junior college** *noun*
(لە ئەمریکا و کەنەدا) خوێندنگای باڵا ◌ مدرسەی عالی
**junior high** = junior high school
**junior high school** *noun*
(ئەمریکا و کەنەدا) پێش‌ئامادەیی (خوێندنگایێ بۆ منداڵانی تەمەن 12 تا 14 یان 15 ساڵان) ◌ دبیرستان مقدماتی
**Junior Leaguer** *noun*
ئەندامی کۆمەڵەی کچان و ژنانی خۆبەخش کە بۆ ڕازەوانی کۆمەڵایەتی ڕێکخراوە ◌ ژونیور لیگور
**junior lightweight** *noun*
کێشێ لە شەڕەمشت 57.1-59 کیلۆگرەم ◌ وزنی در مشت‌بازی
**junior middleweight** *noun*
کێشێ لە شەڕەمشت 66.7-69.8 کیلۆگرەم ◌ وزنی در مشت‌بازی
**junior miss** *noun*
کچێکی پێگەیشتوو یان کامڵ ◌ دختر بالغ
**junior school** *noun*
خوێندنگای سەرەتایی، قوتابخانە، دەبستان ◌ دبستان
**junior technician** *noun*
پلە یان پایەیێکی RAF لەژوور senior aircraftman یان aircraftwoman و لە خوار corporal ـەوە ◌ ژونیور تکنیسین
**junior varsity** *noun*
ئەندامی تیپ یان دەستەی تازەکاری varsity ◌ ژونیور وارسیتی
**junior welterweight** *noun*
کێشێ لە شەڕەمشت 61.2-63.5 کیلۆگرەم ◌ وزنی در مشت‌بازی
**juniper** /ˈdʒuːnɪpə(r)/ *noun*
1 هەوریس، هەوریس، هافرست، قاج، عەرعەر، سەولی کێوی، سەرخ، سەروی چیایی [*Juniperus communis* و جۆرە پێوەندیدارەکان] (ئینگلیسی نیوەڕاست: لە *juniperus* لاتین) ◌ سرو کوهی، اُرس
**junk**[1] /dʒʌŋk/ *noun*
1 شرەوشاتاڵ، شرەوبرە، کرتمرت، هیچەکەوپووچەکە، کۆنە، وردەوپردە 2 ئاسنەواڵە 3 (نافەرمی) هێرۆیین، دەرمان 4 قاورمە 5 توێەڵەی شانەی ڕیشاڵاوی چەوری سەری نەهەنگی مێودار sperm whale کە مێوی کافووری یان سپی spermaceti بەرهەم دێنێ ◌ 1 خرت و پرت 2 قراضە، آهن‌پارە 3 هروئین، گرد 4 گوشت نمک‌زدە 5 جانک
**junk**[2] /dʒʌŋk/ *noun*
1 قامیش، جگەن، چیت 2 تەختەی شکستە(بەندی) ◌ 1 نی 2 تختەی شکستەبندی
**junk**[3] /dʒʌŋk/ *noun*
جانک (کەشتی بادەوەداری بن‌تەختی چینی) ◌ جانک
**Junker** /ˈjʊŋkə(r)/ *noun*
(مێژوویی) ڕەسەنزادە یان خانەدان یان ئەریستۆکراتی ئەڵمانی، ب.ت. یەکێ لە چینی ئەریستۆکراتی پرۆسی بێ ◌ اشراف‌زادەی آلمانی
**Junkerdom** *noun,* Junkerism
مەڵبەندی دەسەڵاتی ئەریستۆکراتی ئەڵمانی ◌ قلمرو نفوذ اشراف‌زادەی آلمانی
**junket**[1] /ˈdʒʌŋkɪt/ *noun*
1 جانکێت (گەڕان و سەردان بۆ خۆشی بە پارەی حکومەت)، پیکنیک 2 میوانی، جەژن، سوور 3 پەنیری چەور ◌ 1 جانکیت، پیک‌نیک 2 مهمانی 3 پنیر چرب
**junket**[2] /ˈdʒʌŋkɪt/ *noun*
جانکێت (= چێشتێ لە شیری هەڵبزرکاو و شەکر) ◌ جانکیت
**junketing** *noun*

میوانی یان ئاهەنگ بە پارەی حکومەت، بەزمورەزم، خۆشی و شادی، جەژنوسوور ۞ جانکیتینگ، جشن و سرور

**junk food** *noun*
شڵپیتاو، گەندەچێشت ۞ جانک فود

**junkie** /ˈdʒʌŋki/ *noun*, also junky
1 (نافەرمی) هێرۆیینی، هێرۆیین‌کێش، گیرۆدە 2 خۆرەی، کرمی، کوشتە و مردەی ۞ 1هروئینی 2 کرم

**junk mail** *noun*
شرەنامەی پۆستی، کۆگانامەی هیچەکە (بریتی لەو کۆما نامەی کەوا لە لایەن دەزگایەکەوە بۆ خەڵک دەنێردرێ) ۞ آت و آشغال پستی

**junk shop** *noun*
کۆنەفرۆشی ۞ سمساری

**junky** /ˈdʒʌŋki/ = junkie

**junkyard** /ˈdʒʌŋkjɑːd, US -jɑːrd/ = scrapyard

**Juno** /ˈdʒuːnəʊ/ *noun*
ژۆنۆ (ژنی ژوپیتێر لە میسۆلۆژی رۆمیدا، بڕوانە Hera) ۞ ژونو

**Junoesque** /ˌdʒuːnəʊˈɛsk/ *adjective*
(ژن) شۆخوشەنگ، ژۆنۆئاسا، ژۆنۆوانە، جوانچاک، سالار (وەکوو ژۆنۆ (خواژنی رۆمی کۆن و ژنی ژوپیتێر) وابێ) ۞ (زن) خوش‌قواره

**junta** /ˈdʒʌntə, US ˈhʊntə/ *noun*
1 جانتا، خونتا، ژانتا، حکومەتی میلیتاری، ئەنجومەنی رامیاری یان سیاسی political council، لێژنەی سیاسی، حکومەتی لەشکری یان سەربازی 2 (مێژوویی) ئەنجومەنی بەڕێوەبەرایەتی یان ڕێبەرایەتی (لە سپانیا و پورتوگال) ۞ 1 خونتا، مجلس سیاسی، هیأت سیاسی، حکومت نظامیان 2 شورای رهبری

**Jupiter** /ˈdʒuːpɪtə(r)/ *noun*, Latin
1 هورمز، ورمز، ژوویپیتێر (= گەورەترین و پێنجەمین هەسارە لە کۆمەڵەی خۆریدا، تیرەی پشتێنەیی 142,796 equatorial diameter کیلۆمیتر (88,729 مایل، مەودای لە خۆرەوە 778.3 ملیۆن کیلۆمیتر (483.6 ملیۆن مایل، ماوەی سووڕانەکەی 11.86 ساڵ و لانی کەم 14 مانگ) 2 هورمز، ژوپیتێر (خودای خودایان، مێردی Juno لە میسۆلۆژی رۆمیدا، بڕوانە Zeus) ۞ 1 مشتری، برجیس 2 ژوپیتر

**Jura** *noun*
1 سەردەمی ژوراسی 2 (هەروەها Jura Mountains) زنجیرە کێوێ لە رۆژاوای ناوەندی ئەورووپا، نێوان فەرەنسە و سویس، لە راینەوە تا رۆن، بەرزترینیان 1723 Crêt de la Neige میتر (5654 پێ) 3 canton ێ لە رۆژاوای سویس Switzerland ۞ 1 دورەی ژوراسی 2 و 3 ژورا

**jural** /ˈdʒʊər(ə)l/ *adjective*
قانوونی، زاکوونی، یاسایی، ماف‌ناسی‌یانە، مافی ۞ قانونی، حقوقی

**Jurassic** /dʒʊˈræsɪk/ *adjective*
(زەوی‌ناسی) ژوراسیک (دووەمین سەردەمی زەوی‌ناسی لە سەردەمانی ژیانی نێوەراست (نێوان سەردەمەکانی تریاسیک Triassic و کرێتاسە Cretaceous، دەوروبەری 208 تا 146 ملیۆن ساڵ لەوە پێش) کە خشۆکە گەورەکان زاڵ بوون و یەکەم باڵندەکان پەیدا بوون (بنەڕەت: لە *Jura* فەرەنسی *jurassique*، لە چیاکانی سەرسنووری فەرەنسە و سویس Switzerland) ۞ ژوراسیک

**jurant** /ˈdʒʊrənt/ *noun*
(ماف) سوێندخۆر ۞ سوگندخورنده، محلف

**jurat** /ˈdʒʊərat/ *noun*
1 (ماف) دادپرس، سەرۆکی شارەوانی 2 کەسێ کە بۆ بەڕێوەبردنی داد و مافی خەڵک سوێند دەخوا ۞ 1 رئیس شهربانی 2 ژورات

**jurel** *noun*
یەکێ لە چەندین جۆری ماسی‌یانی carangid ۞ نوعی ماهی

**juridical** /dʒʊəˈrɪdɪkl, US dʒʊˈr-/ *adjective*
(ماف) دادی، دادگەری‌یانە، دادپەروەری‌یانە، سەربە ماف‌ناسی، قانوونی، زاکوونی ۞ قضایی، حقوقی، قانونی

**juridically** /dʒʊəˈrɪdɪkli, US dʒʊˈr-/ *adverb*
لە باری قانوونی‌یەوە، لە بار یان لە رووی ماف‌ناسی‌یەوە ۞ از نظر قانونی، از لحاظ حقوقی

**jurisconsult** *noun*
(ماف) مافزان، مافناس، قانوونزان ۞ حقوق‌دان، قانون‌دان

**jurisdiction** /ˌdʒʊərɪsˈdɪkʃn, US ˌdʒʊr-/ *noun*
1 دادگەری، دادپەروەری، دادپرسی، دەسەڵاتی قانوونی یان زاکوونی، مافی دەرکردنی بڕیاری قانوونی، رووبەر یان پانتایی دەسەڵات: *These matters do not fall within our jurisdiction* 2 لێوەشاوەی دادگەری یان دەرکردنی بڕیاری قانوونی 3 دەسەڵات، هێز، ماف 4 مەڵبەندی دادگەری، رادە یان پانتایی دادپەروەری، دەسەڵاتی دادگەری 5 مەڵبەند، پانتایی، بوار ۞ 1 قضاوت، قضا، اختیار قانونی، حوزەی اختیارات 2 صلاحیت قضایی 3 اقتدار، حق 4 حوزەی قضایی، اقتدار قضایی 5 قلمرو

**jurisdictional** /ˌdʒʊərɪsˈdɪkʃənl, US ˌdʒʊr-/ *adjective*
سەربە دەسەڵاتی قانوونی یان زاکوونی، پێوەندی بە دەسەڵاتی قانوونی‌یەوە هەیە (*adv* -isdictionally) ۞ وابسته به اختیار قانونی

**jurisprudence** /ˌdʒʊərɪsˈpruːdns, US ˌdʒʊr-/ *noun*
1 زانست یان فەلسەفەی قانوون، زانست یان لێکۆڵینەوەی زاکوون یان قانوون، مافناسی، مافی هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەی قانوونەکان، تیۆری یان فەلسەفەی قانوون: *a professor of jurisprudence* 2 رەوتی دادگەری 3 دەزگا یان سیستمی دادگەری ◌ 1 علم حقوق، نظریه یا فلسفەی قانون 2 رویەی قضایی 3 نظام قضایی
**jurisprudent** /ˌdʒʊərɪsˈpruːdnət, US ˌdʒʊr-/ *noun, adjective*
قانوونزان، بەزاکوونشارەزا، مافناس، مافزان ◌ قانوندان، حقوقدان
**jurisprudential** *adjective*
سەربە زانستی قانوون یان قانوونناسی ◌ وابسته به علم قانون
**jurist** /ˈdʒʊərɪst, US ˈdʒʊr-/ *noun*
شارەزای زاکوون یان ماف، قانوونزان، بەزاکوونشارەزا، مافناس، مافزان ◌ قانوندان، حقوقدان
**juristic** /dʒuːˈrɪstɪk/ *adjective*, also juristical/dʒuːˈrɪstɪkl/
سەربە مافناسی، مافناسییانە، قانوونی، زاکوونی ◌ قانونی، حقوقی
**juristically** /dʒuːˈrɪstɪk(ə)li/ *adverb*
لەباری قانوونییەوە، لە رووی مافناسییەوە ◌ از نظر قانونی، از لحاظ حقوقی
**juror** /ˈdʒʊərə(r), US ˈdʒʊr-/ *noun*
1 ئەندامی دەستەی سوێندخۆران 2 ئەندامی دەستەی نێوگڕیوانان ◌ 1 عضو هیأت منصفه 2 عضو هیأت داوران
**jury**[1] /ˈdʒʊəri, US ˈdʒʊri/ *noun, pl.* juries
1 دەستەی سوێندخۆران: *members of the jury* 2 دەستەی نێوگڕیوانان یان دادوەران ◌ 1 هیأت منصفه 2 هیأت داوران
**jury**[2] /ˈdʒʊəri, US ˈdʒʊri/ *adjective*
(دەریاوانی) کاتی، بۆ ماوەیێ ◌ موقت
**jury-box** *noun*
شوێن یان جێگای دەستەی سوێندخۆران ◌ جایگاه هیأت منصفه
**juryman** /ˈdʒʊərimən, US ˈdʒʊri-/ *noun, pl.* jurymen
1 ئەندامی دەستەی سوێندخۆران 2 ئەندامی دەستەی نێوگڕیوانان ◌ 1 عضو هیأت منصفه 2 عضو هیأت داوران
**jury-mast** /ˈdʒʊəri mæst/ *noun*
دارالای کاتی یان دەزْ ◌ دکل موقت
**jurywoman** /ˈdʒʊəriwʊmən, US ˈdʒʊri-/ *noun, pl.* jurywomen
ئەندامی دەستەی سوێندخۆران، ئەندامی دەستەی نێوگڕیوانان (ژن) ◌ عضو هیأت منصفه، عضو هیأت داوران
**jus** /ʒuː: French ʒy/ *noun*
سوس (ب.ت. لە شێوەی چێشتلێنانی فەرەنسی) ◌ سس
**jusgentium** *noun*
قانوونی جیهانی یا نێونەتەوەیی (لە لاتینەوە: قانوونی نەتەوەکان) ◌ قانون بین‌المللی
**jussanguinis** *noun*
قانوونێ کە هاونیشتمانیبوونی منداڵ لە رووی هاونیشتمانیبوونی باوانییەوە دیاری دەکرێ (لە لاتینەوە: مافی خوێن) ◌ نوعی قانون
**jussive** /ˈdʒʌsɪv/ *adjective, noun*
(ڕێزمان) 1 دەستووری، فەرمانی (وشە، دۆخ و هتد) دەستووری، فەرمانی، فەرماندەربڕ (بنەرەت: لە *jubere, juss-* لاتین "فەرمان، دەستوور command" + -ive) ◌ (دستور زبان) 1 امری 2 (واژه، حالت و...) امری
**jussoil** *noun*
قانوونێ کە هاونیشتمانیبوونی منداڵ لە رووی شوێنی لە دایکبوونییەوە دیاری دەکرێ (لە لاتینەوە: مافی خاک) ◌ نوعی قانون
**just** /dʒʌst/ *adjective, adverb*
*adj* دادپەروەر، دادگەر، بەداد، دادمەند، دادگەرانە، لانەگرانە، بێلایەنانە، دادپەروەرانە، دادمەندانە، رەوا، بەرحەق، بە حەق، جێی خۆی، شیاو، بەجێ، پڕبەپێست، ژیرانە، لۆژیکی، ئاقڵانە، دروست، راست *adv* 1 دروست: *This jacket is just my size* هەر ئێستا، لەم کاتەدا، تازە، ئێستا، نووکە 2 کەمێ، برێ، کەمێ لەوە پێش، برێ لەوە پێش، دەسبەجێ، لەرێوە 3 تەنیا، فەقەت، تەنێ 4 بە سەختی، بە زەحمەت 5 بە زۆر، نزیک بە، نزیکەی، لە دەوروبەری، بەلای نزیکییەوە 6 بە راستی، بەراست ◌ *adj* عادل، منصفانه، بحق، منطقی، دقیق *adv* 1 دقیقاً، همین حالا، الان 2 یک کمی، اندکی پیش، الساعه 3 فقط 4 به سختی 5 تقریباً 6 واقعاً
**just about** *adverb*
نزیکەی: *She should be arriving just about now* ◌ تقریباً
**just-folks** = unpretentious
**justice** /ˈdʒʌstɪs/ *noun*
1 دادگەری، دادپەروەری، داد، رەوابوون، بەرحەقبوون، بەرحەقیتی، راستیتی، دروستبوون: *laws based on the principles of ustice* ◊ *Who can deny the justice of their cause?* 2 دامودەزگای دادگەری، قانوون و بەڕێوەبەرایەتییەکەی 3 دادگەر، دادپرس، دادوەر ◌ 1 عدالت، انصاف، حقانیت، حق 2 تشکیلات قضایی 3 قاضی
**Justice of the Peace** *noun*
دادگەری ئاسایش (دادگەرێ کە لە دۆز و بابەتی

کەمگرنگ لە دادگای خۆجێیدا دەپرسێتەوە)، لادادپرس ◌ قاضی دادگاه بخش

**justiceship** *noun*
دادگەری، دادپرسی، دادوەری ◌ دادرسی

**justiciable** /dʒʌˈstɪʃəb(ə)l/ *adjective*
لەدادگایی‌هاتوو، شیاوی دادگایی، دەتوانرێ بدرێ بە دادگا، بۆ دادگایی دەبێ ◌ قابل محاکمه

**justiciar** /dʒʌˈstɪʃə/ *noun*
(مێژوویی) دادگەری پایەبەرزی دادگا بەرزەکانی سەدەکانی نێوەراستی ئینگلتەرە ◌ دادرس عالی‌رتبەی دادگاه‌های عالی قرون وسطائی انگلستان

**justiciary** /dʒʌˈstɪʃ(ə)ri/ *noun, pl.* justiciaries
1 (زۆرتر لە سکاتلەند) بەڕێوەبەری داد، دادپرس، دادگەر، دادگەری دادگای بەرز یان باڵا 2 بەڕێوەبەرایەتی یا بەڕێوەبردنی داد، رادە یان مەڵبەند یان رووبەری دەسەڵاتی دادگەر ◌ 1 مجری عدالت، قاضی دیوان عالی 2 اجرای عدالت، حوزەی اختیارات قاضی

**justifiability** /ˌdʒʌstəfaɪəˈbɪləti/ *noun*
لەپاساوهاتوویی، رەوابوون، راستیتی، بەجێبوون، دروستبوون، راستبوون، بەرحەقی ◌ توجیه‌پذیری

**justifiable** /ˈdʒʌstɪfaɪəbl, US ˌdʒʌstɪˈfaɪəbl/ *adjective*
لەپاساوهاتوو، پاساودراو، رەوا، راست، دروست، جێی‌پەسند، بەجێ، ژیرانە، بەرحەق: *justifiable pride* ◌ توجیه‌پذیر، موجه

**justifiable homicide** *noun*
(ماف) کوشتنی پاساودراو یان بەرحەق یان لەپاساوهاتوو (لەبەر لەسەرخۆکردنەوە) ◌ قتل توجیه‌پذیر

**justifiably** /-əbli/ *adverb*
لەپاساوهاتووانە، بە حەق، بەرحەقانە، بەجێ ◌ به طور توجیه‌پذیر

**justification** /ˌdʒʌstɪfɪˈkeɪʃn/ *noun*
1 پاساودان، بیانووهێنانەوە، خۆبەڕاندنەوە، سەلماندن، هۆهێناوە، هۆ، بیانوو، بەڵگە، رەوابوون، دروستبوون، راستبوون، بەجێبوون، بەرحەقی 2 (چاپ) مەودابەندی 3 (ئایینەوانی) رووسووری لە بەردەم خوادا ◌ 1 توجیه، تصدیق، دلیل، حقانیت 2 (چاپ) سطربندی 3 جاستیفیکاسیون

**justificative** /ˈdʒʌstɪfɪkeɪtɪv/ *adjective*
پاساودەرانە، justificatory ◌ توجیه‌آمیز

**justificatory** /ˌdʒʌsˈtɪfɪkətəʊri/ *adjective*
پاساودەرانە، vindicatory ◌ توجیه‌آمیز

**justified** /ˈdʒʌstɪfaɪd/ *adjective*
1 جێی‌پەسند، بەجێ، رەوا، پەسند، بەرحەق: *She felt fully justified in asking for her money back* 2 (کامپیوتێر) مەودابەند(کراو، جۆری ڕێکخستنی دەق یان وشەکان کە لای راستەوە بێ یان چەپ) ◌ 1 موجه، محق 2 جاستیفاید

**justifier** *noun*
1 پاساودەر 2 مەودابەند 3 سەلمێنەر ◌ 1 توجیه‌کننده 2 سطربند 3 تصدیق‌کننده

**just-in-time** *adjective, noun*
ئاماژە بە شێوازێکی بەرهەمهێنان کە لەودا ماک و مەتریاڵەکان دەس‌بەجێ بەرلە بەکارهێنانیان رادەگوێزرێن (بە مەبەستی کەمکردنەوەی خەرجوباری هەڵگرتن)، ستراتیژییەکی بەرهەمهێنان کە لەودا ئەو بەشانە بەرهەم دێترێن کە پێویستن ◌ جاست این تایم

**justly** /ˈdʒʌstli/ *adverb*
لانەگرانە، دادپەروەرانە، دادگەرانە، بە حەق، بە دروستی: *to be justly* ◊ *to be treated justly* ◌ *proud of sth* منصفانه، عادلانه، انصافاً

**justness** /ˈdʒʌs(t)nəs/ *noun*
بەرحەقی، رەوایی، دروستی، راستی ◌ حقانیت، صحت

**jut** /dʒʌt/ *noun*
دەرپەڕیوی، رەت‌بوویی، قوتەوەبوویی، پێشوەچوویی، زگ‌دان، پێشوەهاتوویی، ورگ‌دان، دەرپۆقیوی، projection ◌ برآمدگی، پیش‌رفتگی

**Jute** /dʒuːt/ *noun*
ئەندامی گەلی ئەلمانی، لەوە دەچێ لە Jutland (نیمچەدورگەی دانمارک)ەوە بن، کە لە سەدەی پێنجدا لە باشووری بریتانیا جێگیربوون ◌ جوت

**jute** /dʒuːt/ *noun*
1 ریشاڵێکی زبر کە لە قەدی رووەکێکی گەرمێنان دروست دەکرێ، بۆ سازکردنی گوریس و تەناف و شتی وا بەکاردێترێ 2 گوش، گیاگوریس، بەرگواڵە [ *Corchorus capsularis* (چین) و *C. olitorius* (هیند)] (بنەڕەت: لە *jhūto* بەنگالی، لە *juṣṭi* پراکریت Prakrit) ◌ 1 الیاف کتان هندی 2 کتان هندی، چتانی

**Jutish** *adjective*
ژووتی، سەربە یان پێوەندی بە ژووتەوە هەیە ◌ ژوتی، وابسته به ژوت

**Jutlander** *noun*
خەڵک یان دانیشتووی ژووتلەند ◌ اهل ژوتلند

**jutting** *adjective*
دەرپەڕیو، دەرپۆقیو، هەڵقوڵتاو، قوتەوەبوو، سەردەرهێناو، گوپ‌داو، پێشەوەهاتوو، پێشوەچوو، هاتووەپێش، گت، زگ‌داو، ورگ‌داو ◌ برآمده

**jutty** /ˈdʒʌti/ *noun, pl.* jutties
بەشی دەرپەڕیو، چوکڵە، بەشی هاتووەپێش یان پێشەوەهاتوو، قوتایی، گتایی، زەقایی، بەشی هەڵقوڵتاو یان دەرپۆقیو ◌ بخش برآمده

**juvenal** = juvenile

**juvenescence** /ˌdʒuːvəˈnɛs(ə)ns/ *noun*
(فەرمی) تازەلاوی، لاوی، جوانی، جەحێڵی، جـوانی، تـازەیی، گـەنجی (بنـەڕەت: لـە juvenescere لاتـین "گـەیشتنـە juvenescent- تـەمـەنی جـوانی یـان لاویـتی"، لـە juvenis "young") ◌ جوانی

**juvenescent** /ˌdʒuːvəˈnɛs(ə)nt/ *adj*
جەوانەوەبوو، لاوەوەبوو، جوانەوەبوو، تازەوەبوو، جەحێڵەوەبوو، گەنجەوەبوو ◌ جوانشونده

**juvenile** /ˈdʒuːvənaɪl, US -vənl/ *noun, adjective*
*n* 1 منال، تازەلاو (لە زۆربەی وڵاتاندا کەمتر لە 18 سال) 2 (لە گیانەوەراندا) بێچوو، بەچکە، جووچـک، جووجەڵـە 3 کتـێبی منـاڵان *adj* گونجاو یان شیاو بۆ تازەلاون، سەربە مناڵان یان تـازەلاوان، مناڵانـە، گەوجانـە (بنـەڕەت: لـە *juvenilis* لاتین، لە *juvenis* "جوان، جەوان، لاو، کەسێکی جوان یان جـەوان") ◌ *n* 1 نوجـوان 2 (در جانوران) بچـه 3 کتـاب کودکـان *adj* درخـور نوجوانان، وابسته به نوجوانان، بچگانه، احمقانه

**juvenile court** *noun*
دادگـای تـازەلاوان، دادگـای منـاڵان ◌ دادگـاه نوجوانان

**juvenile delinquency** *noun*
تاوانکاری یان خراپکاری منـاڵان، گوناهکـاری منالان یان تازەلاوان ◌ بزهکاری نوجوانان

**juvenile delinquent** *noun*
منالـی تاوانکـار، خراپکـار یـان گوناهکـاریکی منال، تازەلاوی گوناهکار ◌ نوجوان بزهکار

**juvenile hormone** *noun*
(مێروناسـی) هۆرمۆنـێ کـە پەرەسـەندنی کرمۆکەیی یان پرگی لە مێرووەکاندا ڕێک دەخا ◌ هورمون جوونیال

**juvenile onset diabetes** = type 1 diabetes

**juvenile plumage** *noun*
پەروباڵ یان باڵوپەڕی جـوانی یـان لاویتی یـان جەوانی ◌ پروبال جوانی

**juvenilia** /ˌdʒuːvəˈnɪliə/ *noun, pl.*
شوێنەوار یـان ئاسـەواری جەحێڵی (یان لاوی) ◌ آثار جوانی

**juvenility** /ˌdʒuːvəˈnɪlətɪ/ *noun, pl.* juvenilities
1 جـوانی، جەحێڵی، لاوی، گـەنجی، جـەوانی، نوجـوانی، تـازەلاوی 2 (juvenilities) تایبەتمەندی یان کردەوەی لاوانە یـان گـەنجانە ◌ 1 جوانی، نوجوانی 2 (در جمع) ویژگی یا عمل و فعل جوانانه

**juxtaposed** *adjective*
نزیک، هاوسێ، دیواربەدیوار، تەنیشت‌بەتەنیشت، لێکنزیک، لەپاڵیەک ◌ مجاور، همجوار، نزدیک به هم

**juxtaposition** /ˌdʒʌkstəpəˈzɪʃn/ *noun*
1 خـستنەپاڵ، (لـە)پاڵـیەکـدانـان، (لـە)بـەنای یەکدانان، (لە)نزیک یـەکدانان، پێکەوەدانان، لای یـەکدانـان، ڕیزکـردن پێکەوەنووسـاندن 2 هەڵسـەنگاندن، پێک‌گرتن، بەرهەڤدان (بنەڕەت: *juxta* لاتین "نزیک" + *poser* فەرەنسی "دانان") ◌ 1 همکناری 2 همسنجی

**juxtapositional** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە juxtaposition ـەوە هەیە ◌ وابسته به همکناری یا همسنجی

**JV or J.V** *abbreviation* 1 joint venture 2 junior varsity.

**jwlr.** *abbreviation* jeweler.

**Jy.** *abbreviation* July.

# K k

**K**[1], **k** /keɪ, *pl.* Ks, K's, k's /keɪz/ *noun*
1 کێی، کەی (= یازدەیەمین پیتی ئەلفوبێی ئینگلیسی) 2 ئاماژە بە دەنگێ دوای J لە دەستەیێ لە شتەکان، بابەتەکان و هتد 3 شتێک لە شێوەی پیتی K ✧ کی 3 چیز K مانند

**K**[2] *abbreviation* 1 kelvin 2 kilobyte(s) 3 kilometer(s) 4 kilo- 5 symb. the chemical element 6 (kalium) potassium

**ka**[1] *abbreviation (Greek kathode)* cathode

**ka**[2] /kɑː/ *noun*
(لە میسری کۆندا) ئەو بەشە مانایی وادنراوە یان خەیالی‌یەی تاکەکەسێ کە دەڵێن دوای مەرگی دەمێنێتەوە (بنەڕەت: لە میسری‌یەوە) ✧ کا

**Kaaba** /'kɑːbə/ *noun*, also Caaba
کەعبە ✧ کعبە

**kabaddi** /'kʌbədi/ *noun*
جۆرێ کایەی هیندی کە لەودا حەول دەدرێ نەیار بگیردرێ یا خۆی پێ هەڵواسرێ ✧ کابادی

**Kabardian** /kə'bɑːdɪən/ *noun*
1 ئەندامی گەلێکی رەسەنی باکووری رۆژاوای کەوکاز 2 زمانی کەوکازی باکووری ئەو گەلە (بنەڕەت: لە *Kabarda* رووسی، ناوچەیێکی باشووری رۆژاوای رووسیا) ✧ کاباردی

**Kabbalah** /kə'bɑːlə, US 'kabələ/ *noun*, also Kabbala, Cabbala, Cabala, or Qabalah
کابالا: نەریتێکی کۆنی جوولەکە لەمەر لێکدانەوەی سەیری کتێبی پیرۆز ( Kabbalism n Kabbalist n Kabbalistic *adj*) ✧ کابالە

**Kabinett** /,kabɪ'nɛt/ *noun*
جۆرێ مەی باشی ئەڵمانی ✧ کابینت

**kabob** /kə'bɑːb/ = kebab

**kabuki** /kə'buːki/ *noun*
کابوکی (= تیاترێکی نەریتی ژاپۆنی، کە لەودا گۆرانی، هەڵپەڕکێ و مایم (mime) پێشکەش دەکرێ، بنەڕەت: *ka* "گۆرانی"، *bu* "هەڵپەڕکێ" و *ki* "هونەر") ✧ کابوکی

**Kabyle** /kə'bʌɪl/ *noun*
1 ئەندامی گەلێکی بەربەری Berber باکووری ئەلجەزیرە Algeria 2 زاراوەی بەربەری ئەو گەلە (بنەڕەت: لە *kabā'il* عەرەبی، کۆی *kabīla* "خێڵ، هۆز") ✧ کابیلی

**Kachin** /'katʃɪn/ *noun*
1 ئەندامی گەلێ کە لە باکووری بێرمە (میانمار Myanmar) و ناوچە دراوسێ‌کانی لە چین و هیندا دەژین 2 زمانی تەبەتی-بێرمەیی Tibeto-Burman ئەو گەلە ✧ کاچین

**kachina** /kə'tʃiːnə/ *noun*, also katsina
1 گیانی باووباپیری خوداناسا لە میسۆلۆژی سوورپێستە بویبلۆکاندا 2 سەماکێشێ کە ئەو گیانە دەخاتەڕوو kachina dancer ✧ کاچینا

**kadi** = cadi

**kaffee-klatsch** /'kæfeɪklætʃ/ *noun*
(ئەڵمانی) قاوەخۆران، قسە و کۆبوونەوەی دۆستانە ✧ کافی کلاچ

**kaffir** /'kæfə(r)/ *noun*, also Kaffir
(سووکانە) قولەڕەشە، زەنگی، رەش (ب.ت. لە ئەفریکای باشووری) ✧ کاکاسیاه

**Kaffir lily** *noun*
1 (رووەکناسی) جۆرێ گیای ئەمریکای باشووری، بە گوڵی ئەستێرەئاساوە [ *Schizostylis coccinea*] 2 = clivia ✧ نوعی گیاه

**Kaffir lime** *noun*

جۆرێ داری لیمۆیی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا، گەلاکانی بۆنخۆشن و لە چێشتی تایلەندیدا بەکاردێترێن [*Citrus hystrix*] ◌ نوعی درخت

**Kafir** /ˈkafɪə/ *noun*
کافیر: ئەندامی گەلێکی چیاکانی هیند و کوش Hinduی رۆژهەلاتی باکووری ئەفغانستان (**Kafiri** *adj, n*) ◌ کافر Kush

**kafir** /ˈkafɪə/ *noun*
کافر، نامسولمان (بنەڕەت: لە ***kāfir*** عەرەبی "unbeliever infidel") ◌ کافر

**Kafkaesque** /ˌkafkəˈɛsk/ *adjective*
سەربە رۆماننووسی چێک Franz Kafka (1883–1924) یان بەرهەمە توقێنەرەکانی، کافکایی ◌ کافکایی

**kaftan** /ˈkæftæn/ *noun*, also caftan
1 خەفتان، قەسری (= کراسێکی فش و درێژی ژنانە) 2 جبە، عەبا (بنەڕەت: لە تورکییەوە، لە ***kaftān*** فارسییەوە) ◌ 1 خفتان 2 جبه

**kagoul** = cagoule

**kagu** /ˈkɑːguː/ *noun*
جۆرێ باڵندەی بۆرنەی نەفرێ بۆری مەیلەو شین، تەنیا هی دورگەی Caledonia نوێی پاسیفیک [*Rhynochetos jubatus*] ◌ نوعی پرنده

**kahuna** /kəˈhuːnə/ *noun*
1 (لە هاوایی) شەمەن یان پیاوی زیر 2 (ئەمریکا) پیاو یان شتێکی گرنگ ◌ 1 شمن یا مرد خردمند 2 آدم یا چیز مهم

**kail** = kale

**kainite** /ˈkʌɪnʌɪt, ˈkeɪnʌɪt/ *noun*, also kainit
کاینایت، کەینایت، تازە(کان، چونکو تازە یان بەمدواییانە پێکهاتووە): جۆرێ خوێی سروشتی $KMg(SO_4)Cl{\cdot}3H_2O$ کە لە سولفاتی ئاودار و کلۆرایدی مەنیزیۆم و پۆتاسیۆم پێکهاتووە ◌ کاینیت

**kairomone** *noun*
جۆرێ ماکی کیمیایی کە لە لایەن جۆرێ ب.ت. مێروو یان رووەکێ دەدرێتە دەرەوە ◌ کایرومون

**kairos** /ˈkʌɪrɒs/ *noun*
(زۆرتر theology) کاتی باش، وەختی گونجاو، دەرفەت، هەل (بنەڕەت: یونانی "opportunity") ◌ وقت مناسب، فرصت

**Kaiser** /ˈkaɪzə(r)/ *noun*
کایزێر، قەیسەر (ناوی ئیمپراتۆرەکانی ئەڵمانیا و ئاوستریا هەنگاریایی لە 1871ەوە تا 1918 و ئیمپراتۆری رۆمی پیرۆز) ◌ قیصر

**kaiserin** *noun*, fem of Kaiser
ژنی قەیسەر، قەیسەرژن ◌ زوجەی قیصر

**kaiserdom** *noun*
پایە یان مەڵبەندی ژێر دەسەلاتی قەیسەر ◌ مقام یا قلمرو قیصر

**kaizen** /kʌɪˈzɛn/ *noun*
فەلسەفەی کاری ژاپۆنی لەسەر بنەمای پێشکەوتن یان پەرەسەندنی بەردەوام (لە ژاپۆنییەوە "improvement") ◌ کایزن

**kaka** /ˈkɑːkɑː/ *noun*
جۆرێ تووتی زلەی نیوزیلەندی زێرگ‌سوورباو [*Nestor meridionalis*] ◌ نوعی طوطی

**kakapo** /ˈkɑːkəpəʊ/ *noun*, *pl.* kakapos
تووتی کوندە(بوویی)، جۆرێ تووتی نەفری نیوزیلەندی شەوگەری مەترسیلەسەر ◌ [*Strigops habroptilus*] endangered نوعی طوطی

**kakemono** /ˌkɑːkɪˈməʊnəʊ, US ˌkakɪ-/ *noun*, *pl.* kakemonos
کاکیمۆنۆ، ئاوێزە (= تابلۆیەکی وێنەکێشی دیواری ژاپۆنی، لەسەر کاغەز یان کوتاڵی لەخوری) ◌ کاکەمونو

**kakiemon** *noun*
جۆرێ چینی ژاپۆنی کە بە مینا enamel رازێنراوەتەوە ◌ کاکیمون

**kala-azar** /ˌkɑːləˌəˈzɑː/ *noun*
رەشەنەخۆشی، رەشەئازار، دەردەرەشە، نەخۆشییێ کە تووشی ئەندامانی نێوەوە دەبێ و لاوازی، کەمخوێنی و تای پێوەیە ◌ نوعی بیماری

**kalanchoe** /ˌkalənˈkəʊi/ *noun*
(رووەکناسی) جۆرێ رووەکی ئاوداری گەرمێنان، بە هێشووە گوڵی لوولەییەوە [تۆخم *Kalanchoe*] ◌ نوعی گیاه

**Kalashnikov** /kəˈlæʃnɪkɒf, US -kɔːf/ *noun*
کلاشینکۆف ک(ە)لاشینکۆف (لە ناوی Mikhail *T. Kalashnikov*) ◌ کلاشینکف، کلاشنیکف

**kale** /keɪl/ *noun*
1 (رووەکناسی) تۆپەکەلەم [ *Brassica oleracea acephala*] 2 [mustard خێزان (ئافەرمی) پارە، پووڵ ◌ 1 کلم‌پیچ 2 پول

**kaleidoscope** /kəˈlaɪdəskəʊp, US -skoʊp/ *noun*
کالایدۆسکۆپ، لوولەی شێوەبین، دیمەن یان پاتێرنی هەمەڕەنگ، دیمەنی جۆراوجۆر، دیمەنی بگۆڕ ◌ کالیدوسکوپ، متغیر، متنوع

**kaleidoscopic** /kəˌlaɪdəˈskɒpɪk, US -ˈskɑːpɪk/ *adjective*
(دیمەن، شێوە و ڕەنگ) بگۆڕ، ڕەنگاوڕەنگ ◌ متغیر، متلون

**kaleidoscopically** /kəˌlaɪdəˈskɒpɪk(ə)li, US -ˈskɑːpɪk(ə)li/ *adverb*
بگۆڕانە، بە شێوەیێکی بگۆڕ ◌ به طور متغیر

**kalendar** = calendar

**kalends** *noun, pl.*
سەری مانگ، یەکەم رۆژی مانگ (ساڵنامەی

رۆمی) ۞ اولین روز ماه

**kalimba** /kə'lɪmbə/ *noun*

جۆرێ پیانۆی کەڵەموستی ئەفریکایی ۞ کالیمبا

**kalium** /keɪlɪəm/ = potassium

**kalmia** /'kalmɪə/ *noun*

(رووەکناسی) جۆرێ دەوەنی هەمیشەسەوزی گەڵاچەرمینە، لە تیرەی heather، بە هێشووە گوڵی سوور و پەمەیی‌یەوە، ڕەسەنی ئەمریکای باکووری و کوبا [توخم *Kalmia*] ۞ کالمیا

**Kalmyk** /'kalmʌk/ *noun*, also Kalmuck, *pl.* same or Kalmyks or Kalmucks

1 ئەندامی گەلی مۆنگۆلی بودیستی کە زۆربەیان لە کالمیکیا Kalmykia (کۆماری لە ڕۆژاوای باشووری ڕووسیە) دەژین 2 زمانی ئالتایی Altaic ئەو گەلە (بنەڕەت: لە *kalmyk* ڕووسی‌یەوە) ۞ کالمیکیایی

**kalong** /'kɑːlɒŋ/ *noun*

جۆرێ ڕێوی هەڵبەزیو لە ڕۆژهەڵاتی باشووری ئاسیا و ئیندۆنیزیا، ڕێوی خۆهەڵدەر [ *Pteropus vampyrus* و جۆرەکانی تر] ۞ کالونگ

**kalpa** /'kalpə/ *noun*

(لە نەریتی بودائیستی و هیندوودا) قۆناخی نێوان پێکهاتن و کۆتایی جیهان (وەکوو ڕۆژی براهماش دادەنرێ) ۞ کالپا

**Kama** /'kɑːmə/ *noun*

خودای خۆشەویستی هیندووەکان ۞ کاما

**Kama Sutra** /ˌkɑːmə 'suːtrə/ *noun*

سپارەیەکی کۆنی سانسکریتی لەسەر هونەری دڵداری و شێوەی هەڵسوکەوتی سێکسی (بنەڕەت: سانسکریتی: *kāma* "خۆشەویستی" + *sūtra* "دەزوو، بەن") ۞ کاما سوترا

**Kamba** /'kambə/ *noun*, *pl.* same, Kambas, or Wakamba

1 ئەندامی گەلی کینیای ناوەندی 2 زمانی بانتۆیی ئەو گەلە ۞ کامبا

**kame** /keɪm/ *noun*

(زەویناسی) شانە: تەپۆلکە لە بەرد و لم پێکهاتووە ب.ت. لە سەردەمی سەهۆڵبەندانا (بنەڕەت: شێوەی سکاتلەندی comb) ۞ کیم

**kameez** /kə'miːz/ *noun*, *pl.* same or kameezes

جۆرێ tunic درێژ، هی خەڵکانی نیمچەوشکاری هیند ۞ کامیز

**Kamehameda Day** *noun*

11 ی ژووەن وەک ڕۆژێکی پشوو بە یادی لەدایکبوونی Kamehamedaی یەکەم ۞ کامهامدا دی

**kami** /'kɑːmi/ *noun*, *pl.* same

بوونی خودایی لە دینی شینتۆدا ۞ کامی

**kamikaze** /ˌkæmɪ'kɑːzi/ *noun*, *adjective*

*n* 1 (شەڕی جیهانی دووەم، لە ژاپۆندا) فڕۆکەی خۆکوژی‌یانە، فڕۆکەی خۆپیاکردوو (بەنێو کەشتی‌یەکانی دوژمندا) 2 فڕۆکەوانی خۆکوژی‌یانە *adj* خۆکوژی (ژاپۆنی: *kami* "خودایی" + *kaze* "با") ۞ *n* 1 هواپیمای انتحاری 2 خلبان هواپیمای انتحاری *adj* انتحاری

**Kamilaroi** /kə'mɪlərɔɪ/ *noun*, *pl.* same

1 ئەندامی کۆمەڵێ لە گەلانی ڕەسەنی ئەوستراڵیایی ویلزی باشووری نوێ 2 زمانی نەماوی ئەو گەلە ۞ کامیلارونی

**kampong** /kam'pɒŋ, US 'kampɒŋ/ *noun*

گوندی مالیزیایی ۞ دهکده

**Kampuchean** /ˌkampʊ'tʃiːən/ = Cambodian

**Kan.** *abbreviation* Kansas

**kana** /'kɑːnə/ *noun*

(لە ژاپۆن) کانا (سیستمی نووسینی کەرتەیی syllabic) ۞ کانا

**Kanarese** /ˌkanə'riːz/ *noun*, *adjective*, *pl.* same, also Canarese

*n* 1 = Kannada 2 ئەندامی گەلێ کە زۆربەیان لە Kanara، ناوچەیێ لە باشووری ڕۆژاوای هیندوستاندا دەژین *adj* سەربە کانارا، خەڵکەکەی یان زمانەکەیان ۞ کانارێز

**kanga** *noun*, also khanga /'kæŋgə/, also lesso

کانگا (جۆرێ جلی ژنانی ئەفریکایی) ۞ کانگا

**kangaroo** /ˌkæŋgə'ruː/ *noun*, *pl.* kangaroos

کانگۆرۆ، دووپیلکە؟، خێزان Macropodidae [توخم *Macropus*: چەندین جۆرن] (*adj* kangaroolike) ۞ کانگورو

**kangaroo court** *noun*

دادگای نافەرمی an unofficial court یان فشە (کە لەوێدا (بنەماکانی) داد ڕەچاو ناکرێ) ۞ دادگاه غیررسمی یا پوشالی

**kangaroo mouse** *noun*

(گیانەوەرناسی) مشکی کانگۆرۆیی، لە ئەمریکا (ی باکووری) دەبینرێ [توخم *Microdipodops*: دوو جۆری هەیە] ۞ موش کانگورویی

**kangaroo paw** *noun*

(ڕووەکناسی) جۆرێ ڕووەکی ئەوستراڵیایی گوڵلوولەچەیی [توخم *Anigozanthos* و *Macropidia*: چەندین جۆرن] ۞ نوعی گیاه

**kangaroo rat** *noun*

مشکی دانخۆرە [توخم *Dipodomys*: چەندین جۆرن] ۞ نوعی موش

**kangaroo vine** *noun*

جۆرێ ڕەز یان مێوی هەمیشەسەوزی ئەوستراڵیایی، وەک گیا یان ڕووەکی ماڵێ وایە [*Cissus antarctica*] ۞ نوعی تاک

**kanji** /'kandʒi, US 'kɑːn-/ *noun*, *pl.* same

سیستمیکی نووسینی ژاپۆنی کە نیشانە یان پیتەکانی چینی بەکاردێنێ، چینی‌نیشان (بنەڕەت: ژاپۆنی، لە *kan* "چینی" + *ji* "نیشانە") ◌ کانجی

**Kannada** /ˈkænədə/ *noun*, also Kanarese /ˌkænəˈriːz/
کەنیدا (زمانی (دراڤیدی) کە لە کارناتاکا Karnataka لە ڕۆژاوای باشووری هیند قسەی پێ‌دەکرێ) ◌ کندا

**kanoon** /kɑːˈnuːn/ *noun*
قانوون (ناوی ئامێرێکی بەناوبانگ) ◌ قانون

**Kansan** /ˈkanzən/ *noun, adjective*
*n* کانزاسی خەلکی هەرێمی کانزاسی Kansas ئەمریکا *adj* سەربە یان پێوەندی بە کانزاسەوە هەیە، کانزاسی ◌ کانزاسی

**kantele** *noun*
zuther یکی خۆماڵی فینلەندی پێنج‌ژێ ◌ کانتل

**Kantian** /ˈkantɪən/ *adjective, noun*
*adj* سەربە فیلسووفی ئەڵمانی ئیمانوئیل کانت Immanuel Kant (1724–1804) یان فەلسەفەی کانت *n* لایەنگری فەلسەفەی کانت (Kantianism *n*) ◌ کانتی

**kaolin** /ˈkeɪəlɪn/ *noun*
گڵەچینی (بنەڕەت: لە فەڕەنسی، لە *gāoling* چینی "تەپ یان گردی بەرز"، ناوی چیایێ لە هەرێمی Jiangxi کە ئەو گڵەی لێ دۆزراوە (kaolinic *adj*: سەربە گڵەچینی) ◌ خاک چینی

**kaolinite** /ˈkeɪəlɪnʌɪt/ *noun*
کائۆلینیت، کائۆلینایت: جۆرێ کانی سپی لە سیلیکاتی ئاوداری ئالۆمینیۆم پێکهاتووە و پێکهێنەری سەرەکی کائۆلینە ◌ کائولینیت

**kaolinitic** *adjective*
سەربە کائۆلینیت یان کائۆلینایت، پێوەندی بە کائۆلینایتەوە هەیە ◌ وابستە بە کائولینیت

**kaon** /ˈkeɪɒn/ *noun*
(فیزیک) کائۆن ◌ کائون

**kapellmeister** /kəˈpɛlˌmʌɪstə/ *noun*
(لە ولاتانی ئەڵمانی‌زماندا) ڕێبەر یا بەڕێوەبەری سازبەند یان کۆر ◌ رهبر ارکستر یا کور

**kaph** *noun*
کاف: یازدەمین پیتی ئاوبێتی عیبری (واتا: بەری دەس، "k, kh") ◌ کاف

**kapok** /ˈkeɪpɒk, US -pɑːk/ *noun*
مەتریاڵێ کە شێوەی خوری پەموو یان کەتانی دەدا ◌ کاپوک

**Kaposi's sarcoma** /kəˌpəʊsiz sɑːˈkəʊmə, US kəˌpoʊsiz sɑːrˈkoʊmə/ *noun*
کاپۆسیز سارکۆما (جۆرێ شێرپەنجە کە زۆرتر تووشی کەسانێ دەبێ کە سیستەمی پاراستنی لەشیان لاواز بووە، بۆ نموونە بە هۆی AIDS، لە ناوی پێستناسی هەنگاریایی .Moritz K Kaposi) ◌ نوعی سرطان

**kappa** /ˈkæpə/ *noun*
کاپا (= دەیەمین پیتی ئەلفوبێی یونانی Κ, κ؛ بنەڕەت: لە یونانی‌یەوە، سامی‌بنەڕەت، لە *kaph* عیبری‌یەوە) ◌ کاپا

**kapu** /ˈkapuː/ *noun*
(لە دین و چاندی هاوایی‌دا) کۆمەڵێ دەستوور و ڕێسا و شتە بەربەندەکانی ژیانی ڕۆژانە ◌ کاپو

**kapur** /ˈkapə/ *noun*
(ڕووەکناسی) کافوور (دارێکی گەورەی گەرمێنان، بەرەکەی دەخورێ [تۆخم Dryobalanops]) ◌ کاپور

**kaput** /kəˈpʊt/ *adjective*
(تافەرمی) خراپ، شکاو، داغن، کارنەکردوو، پەک‌کەوتوو، بەکارنەهاتوو، بێ‌سوود، بێ‌کەڵک، بێ‌بەهرە، useless ◌ شکسته، نابود، بی‌فایده

**karabiner** /ˌkarəˈbiːnə/ *noun*, also carabiner
جۆرێ ئاڵقەی لاکێشەیی پێکبەست کە تەناف دەتوانێ بە ئازادی تیایا هات‌وچۆ بکا و لە شاخەوانی‌دا بەکاردێنرێ ◌ کارابینر

**karahi** /kʌˈrʌɪ/ *noun, pl.* karahis
جۆرێ تاوەی کاسەیی هیندی‌یەکان ◌ کاراهی

**Karaism** /ˈkɛrəaɪzəm/ *noun*
کارائیزم: تیرەیێ لە جوولەکە کە لە سەدەی هەشتەمدا لە بەغدا دامەزرا و هەر چەشنە لێکدانەوە و ڕاڤەیێکی تەلموود و ڕابینیستی ڕەت دەکردەوە و تەنیا باوەڕی بە دەقی تەورات بوو ◌ کارائیسم، قرائین

**Karaite** /ˈkɛːrəʌɪt/ *noun*
ئەندامی تیرەی کارائیزم ◌ کارائیت

**karakul** /ˈkarəkʊl/ *noun*, also caracul
1 کاراکول: ڕەگەزێکی مەڕی ئاسیایی، بە شەکی خوری‌یەکی لوول و ڕەشە 2 پارچە یا فەرووی ئەو مەڕە یا خوری‌یێکی وا (بنەڕەت: *Karakul* "دێیێ لە ئۆزبەکستان "Uzbekistan) ◌ کاراکول

**karat** = carat

**karate** /kəˈrɑːti/ *noun*
کاراتە (بنەڕەت: *kara* "بەتاڵ، ڕووت" و *te* "دەست") ◌ کاراته

**karateka** /kəˈrɑːtɪkɑː/ *noun, pl.* same or karatekas
کاراتەکار، کاراتەباز ◌ کاراتکا

**Karelian** /kəˈriːlɪən/ *noun, adjective*
*n* دانیشتووی Karelia، ناوچەیێکی سەرسنووری ڕووسیا و فینلەند، کارێلیایی *adj* سەربە کارێلیا، کارێلیایی ◌ کاریلیایی

**Karen** /kəˈrɛn/ *noun, pl.* same or Karens
1 ئەندامی گەلی ڕۆژهەلاتی بیرمە و ڕۆژاوای تایلەند 2 زمانی چینی-تەبەتی Sino-Tibetan

ئەو گەلە ◌ کارن

**karma** /ˈkɑːmə, US ˈkɑːrmə/ *noun*

1 کارما (لە بودیزم و هیندوییزم‌دا، باوەڕ بەو کردەوە و ئاکارانەی کە لە ژیانی دوایی کەسێک‌دا کاریگەرە) 2 (خوازە) چارەنووس (karmic *adj*: سەربە کارما، کارمیک؛ بنەڕەت: لە *karman* سانسکریت "action، effect، fate") ◌ 1 کارما 2 (مجازی) سرنوشت

**Karok** *noun, pl.* Karoks

1 ئەندامی گەلێکی سوورپێست، لە دۆڵی رووباری Klamathی نێوەراست لە باکووری رۆژاوای کالیفۆرنیا 2 زمانی کارۆک ◌ کاروک

**karoo** *noun,* also karroo, pl. karoos or karroos

بانوو یان دەشتەبەرزێکی وشکی باشووری ئەفریکا ◌ کارو

**karoshi** /kaˈrəʊʃi/ *noun*

(لە ژاپۆن‌دا) مردن لەبەر کاری زۆر، مەرگەکار ◌ کاروشی

**kaross** *noun*

جۆرێ جلی سادە لە کەوڵ یان پێستە، هی خەڵکی رەسەنی باشووری ئەفریکا ◌ کاروس

**karri** /ˈkari/ *noun, pl.* karris

دارکافووری درێژی ئەوسترالیایی کە زۆر سەختە و سوورە [*Eucalyptus diversicolor*] ◌ کاری

**karst** /kɑːst/ *noun*

ناوچەیێکی ناڕێکی بەردەقسڵی کە sinkhole، ئەشکەوتی گەورە cavern، کەندال (یان قەڵەشت) یان ئاوی بن‌عەرزی هەبێ (بنەڕەت: لە *Karst* ئەڵمانی‌یەوە، ناوچەیێکی بەردەقسڵی سلۆڤینیا Slovenia) ◌ کارست

**karstic** *adjective*

کارستی، سەربە یان پێوەندی بە کارستەوە هەیە ◌ وابستە بە کارست

**kart** /kɑːt, US kɑːrt/ = go-kart

**kary(o)-** *prefix*

پێشگر: 1 (زیندە(وەر)ناسی) ناوکی خانە، نێوکی خانە: *karyotype*، *karyokinesis* 2 کاکڵ، ناوک، کرۆک، دەنک: kernel *caryopsis* (لە *karuon* یۆنانی "kernel") ◌ پیشوند: 1 هستەی یاختە 2 هستە، مغز

**karyogamy** *noun, pl.* karyogamies

یەک‌گرتنی ناوکەکانی خانە (وەک لە fertilization دا) ◌ کاریوگامی

**karyokinesis** /ˌkarɪəʊkɪˈniːsɪs, US -kʌɪ-/ *noun*

(زیندەناسی) دابەش‌بوونی ناوکی خانەیێ بە درێژایی دابەش‌بوون یان کەرت‌بوونی ناراستەوخۆوە ◌ کاریوکنسیس

**karyological** *adjective,* also karyologic*al*

سەربە ناوک‌ناسی یان کاریۆلۆژی ◌ وابستە بە کاریولوژی

**karyology** *noun*

ناوک‌ناسی، کاریۆلۆژی ◌ کاریولوژی

**karyoplasm** = nucleoplasm

**karyoplast** *noun*

کاریۆپلاست: پرۆتۆپلازمی ناوکی خانە nucleoplasm ◌ کاریوپلاست

**karyosome** *noun*

کاریۆزۆم، کاریۆسۆم: کۆمەڵێ کرۆماتینی ناوکی خانە، شێوەی nucleolus دەدا ◌ کاریوسوم

**karytype** /ˈkarɪə(ʊ)tʌɪp/ *noun*

سەرجەم تایبەتمەندی ناوکی خانەیی ◌ کاریوتیپ

**karytypic** *adjective*

سەربە سەرجەم تایبەتمەندی ناوکی خانەیی ◌ وابستە بە کاریوتیپ

**kasbah** /ˈkazbɑː/ *noun,* also casbah

1 قەڵای ئەفریکای باکووری 2 ناوچەی دەوروپشتی قەڵا (بنەڕەت: لە *kaṣaba* عەرەبی‌یەوە وەرگیراوە) ◌ 1 ارگ یا دژ آفریکای شمالی 2 محوطەی دژ

**Kashmir goat** *noun*

بزنی کەشمیر ◌ بز کشمیر

**Kashmiri** /kaʃˈmɪəri/ *noun, adjective*

*n* 1 خەڵکی کەشمیر، ناوچەیێ لەسەر سنووری هیند و پاکستان 2 زمانی هیندی کەشمیری *adj* سەربە کەشمیر، خەڵکی کەشمیر و زمانەکەیان ◌ کشمیری

**kashrut** /kaʃˈruːt/ *noun,* also kashruth

کۆمەڵێ لە قانوونە دینی‌یەکانی جوولەکە لەبارەی خۆراک، بەکارهێنانی سروتەکانەوە و هتد، رەوایێتی ◌ کشروت، مشروعیت

**kata** /ˈkɑːtɑː/ *noun, pl.* same or katas

(ژاپۆنی) سیتمێکی مەشق و راهێنانی تاکەکەسی لە کاراتە و هونەرە شەڕی‌یەکانی تردا (وەک لە کاراتەدا) ◌ کاتا

**katabasis** /kəˈtæbəsɪs/ *noun*

کشانەوە، پاشەکشێ، هاتنەخوارەوە ◌ عقب‌نشینی، نزول

**katabatic** /ˌkatəˈbatɪk/ *adjective*

خوارەوەهاتوو (لە *katabatikos* یۆنانی، *katabainein* "هاتنەخوارەوە") ◌ نازل

**katabolism** = catabolism

**katakana** /ˌkatəˈkɑːnə/ *noun*

کاتاکانا: شێوەیەکی گۆشەداری کانای ژاپۆنی، ب.ت. بەکاردێنرێ بۆ وشەی بەڕەچەڵەک بیانی ◌ کاتاکانا

**katana** /kəˈtɑːnə/ *noun*

شمشێری درێژی یەک‌دەمەی سامۆرایی‌یەکانی ژاپۆن ◌ کاتانا

**Kathak** /ˈkʌtək/ *noun*

1 جۆرێ هەڵپەرکێی هیندی‌یە باکووری‌یەکان 2 ئەندامی چینێکی (*pl.* same or Kathaks) چیرۆک‌بێژان و موسیقاژەنانی هیندی (بنەڕەت: لە *kathaka* سانسکریتی "چیرۆک‌بێژی پیشەیی"، لە *kathā* "چیرۆک story") ◌ کاتاک

**Kathakali** /ˌkɑːtəˈkɑːli, US ˌkʌtəˈkʌli/ *noun*
کاتاکالی: جۆرێ هەڵپەرکێی دراماتیکی هیندی باشووری، لەسەر بنەمای ویژەی literature هیندوو ◌ کاتاکالی

**katharevousa** /ˌkaθəˈrɛvuːsə/ *noun*
شێوەیەکی کۆن و قورسی یۆنانی نوێ، لە بواری نووسراوەی ویژەیی نەریتی‌دا بەکاردێتری (بڕوانە Demotic) ◌ کاتاروسا

**katharsis** = catharsis

**kathartic** = cathartic

**katsina** *pl.* katsinam= cachina

**katsura** /katˈsʊərə/ *noun*
1 دارێکی جوانی ئاسیای ڕۆژهەلات [*Cercidiphyllum japonicum*] 2 جۆرێ کڵاوقژی ژاپۆنی (ژنان زۆرتر لەسەری دەکەن؛ بنەڕەت: لە ژاپۆنی‌یەوە) ◌ کاتسورا

**katydid** /ˈkeɪtɪdɪd/ *noun*
شێرەکوللە، کەیتیدید، کاتی‌دید (جۆرێ کوللەی گەورە، ڕەسەنی ئەمریکای باکووری [*Microcentrum* و توخمەکانی تر]) ◌ کاتی‌دید

**kauri** /ˈkaʊri/ *noun, pl.* kauris, also kauri pine
جۆرێ داری کاژی بەرز لە نیوزیلەند [*Agathis australis*] ◌ کاوری

**kauri pine** = kauri

**kava** /ˈkɑːvə/ *noun*
کاڤا (= خواردنەوەیەکی بێهۆش‌کەری پۆلینیزیا، لە هاراوەی ڕەگی گیایێ لە خێزان و تیرەی بیبار [*Piper methysticum*]) ◌ کاوا

**kawa-kawa** /ˈkɑːwəˌkɑːwə/ *noun*
کاواکاوا: جۆرێ دەوەنی نیوزیلەند لە تیرەی بیبار بە گەڵای بۆن‌خۆشەوە [*Macropiper excelsum*] ◌ کاواکاوا

**Kawasaki disease** *noun*, also Kawasaki syndrome
نەخۆشی یان کۆنیشانەی کاوازاکی یان کاواساکی: نەخۆشی‌یێکی منالان (ی ساوا) کە هۆیەکەشی روون نیە و تا fever، زیپکە یان لیرگ، چاوێشە conjunctivitis، ماسینی لێو و زمان، ئاوسانی ڕژێنە لەشاوی‌یەکانی مل و جاروباریش کێشە و نارەحەتی دڵی پێوەیە (بنەڕەت: لە ناوی پزشکی ژاپۆنی Tomisaku *Kawasaki*) ◌ بیماری کاوازاکی

**kayak** /ˈkaɪæk/ *noun*
کایاک (= جۆرێ بەلەمی باریک و سووکی ئیسکیموکان، بە چەرمی سیل دادەپۆشرێ (بنەڕەت: لە *qayaq* ئیسکیمویی‌یەوە) ◌ کایاک

**kayo** /keɪˈəʊ/ *noun, pl.* kayos
تەختی عەرزکردن، بە عەرزداکوتان ◌ کایو، ناک‌اوت

**Kazakh** /kəˈzak, US ˈkazak/ *noun*
1 کازاخستانی 2 زمانی کازاخستانی ◌ 1 قزاخستانی 2 زبان قزاخستانی

**kazillion** /kəˈzɪljən/ = gazillionb

**kazoo** /kəˈzuː/ *noun*
کازو (= جۆرێ ئامێر یان سازی کایەی منالانە) ◌ کازو

**KB** *abbreviation* King's Bench
(لە بریتانیا) دادگای بالا ◌ دیوان عالی

**KC** /ˌkeɪ ˈsiː/ *abbreviation* King's Counsel
(لە بریتانیا) پارێزەر، ئەولەکار ◌ وکیل مدافع

**kea** /ˈkiːə/ *noun*
تووتی‌یێکی کێوی نیوزیلەند، تووتی‌کەلاک‌خۆرە [*Nestor notabilis*] ◌ نوعی طوطی

**kebab** /kɪˈbæb/ *noun*, US also kabob
کەباب ◌ کباب

**kecks** *noun, pl.*
(بریتانیا و نافەرمی) شەڵوار یا ژێرشەڵوار، دەرپێ ◌ شلوار، زیرشلواری

**ked** *noun*, also sheep ked
کێچی مەڕ [*Melophagus ovinus*] ◌ شپش گوسفند

**kedg** /kedʒ/ *noun*, also kedg anchor
لەنگەری سووک، سووکەلەنگەر، لەنگەری چکۆلە ◌ لنگر کوچک

**kedgeree** /ˈkedʒəriː/ *noun*
کێجیری، کەجەری (= جۆرێ چێشت بە برنج، ماسی و هێلکەی کوڵاو و جارجاریش پیواز لێدەنرێ) ◌ کجری

**keech** /kiːx/ *noun*
(سکاتلەند و نافەرمی) پیسایی، گوو ◌ مدفوع

**keek** *noun*
(سکاتلەند) چاولێ‌کردن بە دزی‌یەوە، لە کونەوە چاولێ‌کردن، سەرەتاتکێ ◌ نگاه دزدانه

**keel**[1] /kiːl/ *noun*
1 کاریتەی بن یان تەختی کەشتی، بڕبڕەی کەشتی، نیرگە یان شیلمانی بن کەشتی 2 (گیانەوەرناسی) ئێسکەکۆلە یان تیرەغە (یان تیرەگە)ی بەرسنگی باڵندە 3 (ڕووەک‌ناسی) جووتێ پەڕی لۆتکەئاسا لە گوڵانی تیرە نۆک، لۆتکە ◌ 1 تیر حمال 2 و 3 زورق

**keel**[2] /kiːl/ *noun*
جۆرێ گەمی بن‌تەختی خەڵووزکێشی ڕووبارەکانی Tyne و Wear ◌ کیل

**keelage** /ˈkiːlɪdʒ/ *noun*
لەنگەرانە، حەق یان پارەی لەنگەرخستن ◌

حق لنگراندازی

**keelback** *noun*

ماری بێ‌زیانی ئەوسترالیایی، لە دەم ئاوا دەژی ◌ کیلبک

**keelboat** *noun*

جۆرێ گەمی زلەی تەختی باری، لە چۆم و رووبارەکانی ئەمریکادا بەکاردێتریێ ◌ کیلبوت

**keelson** /'ki:ls(ə)n/ *noun*, also kelson

کاریتە یان شێلمانی کەشتی یان لاشەی ژێرەوەی کەشتی کە لەسەر کاریتە یان نیرگەیە ◌ کیلسون

**keen**[1] /ki:n/ *noun*

(لە ئیرلەند) چەمەری، شیوەن، واوەیلێ، رۆرۆ، سەردولکە (بنەڕەت: ئیرلەندی) ◌ مرثیە

**keen**[2] /ki:n/ *adjective*

1 بەتاسە، تامەزرۆ، بەپەرۆش، بەتاو، دڵبەستە 2 توند، سەخت، گران، زۆر، بەهێز، تاوسەندوو 3 تیژ، مووکردوو، بڕا، نووک تیژ، لێوارتیژ 4 (بۆن و هتد) تیژ، زۆر 5 هەستیار 6 زووتێگەیشتوو، وریا، زیرەک، تیژ: *a keen awareness of the problem* 7 (پێشبڕکێ و هتد) سەخت، گران، چەتوون، توند 8 (با) تەزدار، سارد، ئێسک‌بڕ 9 (بریتانیا، نرخ) کەم، لە خوارێ، هەرزان ◌ 1 مشتاق، علاقەمند 2 شدید 3 برندە، تیز 4 (بو و...) زیاد 5 حساس 6 بافراست، زوددریابندە 7 (رقابت و...) فشردە 8 (باد) سوزدار 9 پایین

**keen-edged** /ki:n edʒd/ *adjective*

دەم‌تیژ، لێوارتیژ ◌ دارای لبەی تیز

**keener** /'ki:nə(r)/ *noun*

سەردولکەبێژ، مردووولاوێن ◌ نوحەسرا

**keen-eyed** /ki:n aɪd/ *adjective*

چاوتیژ ◌ دارای چشمان تیز

**keenly** /ki:nlɪ/ *adverb*

بە توندی، سەخت، بە سەختی ◌ بە شدت

**keenness** /ki:nnəs/ *noun*

1 تیژی، بڕایی 2 تامەزرۆیی، بەتاوی، بەپەرۆشی 3 توندی، سەختی 4 زیرەکی، وریایی، زووتێگەیشتوویی، تیژی 5 هەستیاری ◌ 1 تیزی 2 اشتیاق 3 شدت 4 فراست 5 حساسیت

**keen-witted** /ki:n wɪtɪd/ *adjective*

زیرەک، بیرتیژ، وریا ◌ باذکاوت

**keep** /ki:p/ *noun*

1 برجی قەڵا، کەلات، کەلووی قەڵا، قەڵا (ب.ت. لە ناوەندی قەڵادا) 2 خۆراک، پێ‌بژیو، ژیوار، خەرجی رۆژانە، خەرج 3 (نافەرمی) بۆ هەمیشە، بۆ هەتاهەتا 4 (کۆن) مەهار، کۆنترۆڵ، دەس‌بەسەراگرتن، راگرتن 5 راگرتن، پاراستن، ئاگالێ‌بوون، چاودێری، سەرپەرستی، نۆبەداری، سەخبێری ◌ 1 برج قلعە، قلعە 2 معاش، قوت 3 برای همیشە 4 مهار، کنترل 5 نگهداری، حفاظت

**keeper** /'ki:pə(r)/ *noun*

1 چاوبەسەرەوەبوو، چاودێر، پاریزەر، سەرپەرشت، ئاگاداری‌کەر، ئاگادێر، نۆبەدار، (لە لێکدانا) ـوان، ـڤان، ـدار، ـراگر، ـپارێز 2 (نافەرمی) گۆڵپارێز 3 قۆرخ‌چی، پاسەوان، نۆبەدار، چاودێری گیانەوەر و باڵندەکان 4 گیرە 5 میل، میلە ◌ 1 محافظ، نگهبان، (در ترکیب) ـبان، ـدار، ـنگهدار 2 (عامیانە) دروازەبان 3 شکاربان 4 گیرە 5 میلە

**keeping** /'ki:pɪŋ/ *noun*

1 ئاگالێ‌بوون، چاودێری، ئاگاداری، نیگادێری، چاوبەسەرەوەبوون، نۆبەداری، پاراستن، سەرپەرشتی، بەتەنگەوەبوون، سەرنج‌پێدان 2 رەچاوکردن، پاراستن 3 راهاتن، سازان، گونجان 4 خۆراک 5 تفاق، ئالیک ◌ 1 نگهداری، حفظ، توجە 2 رعایت 3 وفق، سازش 4 غذا 5 علوفە

**keepsake** /'ki:pseɪk/ *noun*

یادگار، یادگاری ◌ یادگاری

**keeshond** /'keɪshɒnd/ *noun*

کیشۆند: سەگێکی رەگەز هولەندی بە تووکێکی بۆر و زبری درێژەوە، شێوەی زلە Pomeranian دەدا ◌ کیشوند

**keester** /'ki:stə/ = keister

**keeve** /'ki:v/ *noun*

کووپە ◌ خمرە

**kef** /keɪf/ *noun*, also kif

مەریوانە، بەنگ (بنەڕەت: لە *kayf* عەرەبی‌یەوە "خۆشی") ◌ حشیش

**keftedes** /kɛf'tɛði:z/ *noun, pl.*

(لە ئاشپەزی یۆنانی‌دا) کفتە (بنەڕەت: لە *koftah* فارسی‌یەوە) ◌ کفتە

**keg** /keg/ *noun*

بەرمیلی چکۆلە، کۆسچە، بۆشکەی چکۆلانە (کەم‌تر لە 10 گالۆنی بریتانیایی و 30 گالۆنی ئەمریکایی دەگرێ) ◌ بشکەی کوچک

**keg beer** *noun*

بیری بەرمیلی، ئاووجۆی بۆشکە یان کۆسی ◌ آبجو بشکەای

**keister** /'ki:stə/ *noun*, also keester

1 (لە ئەمریکای باکووری و نافەرمی) سمتی مرۆڤ، کنگ، تەریزە 2 چەمەدان، جامەدانە، بوخچە ◌ 1 باسن 2 چمدان

**Kejia** /keɪ'dʒjɑ:/ = hakka

**kelim** = kilim

**keloid** /'ki:lɔɪd/ *noun*

(پزشکی) پەنجەقرژاڵ، قرژاڵ‌پەنجە، گرێی جێگای برین ◌ کلوید

**kelp** /kelp/ *noun*

1 (رووەکناسی) قەوزەی قاوەیی [*Laminaria*] و توخمەکانی تر، خێزان [Laminariaceae]؛ کۆمەڵەکەیێکی بەربڵاوی قەوزەی قاوەیی 2 خۆڵەمێشی ئەو قەوزەیە وەک سەرچاوەی

iodine ◌ 1 کتانجک 2 کلپ

**kelpie** /'kelpi/ *noun*

1 خێو یان پەری ناوی فۆلکلۆری سکاتلەندی، زۆرتر بە شێوەی ئەسپ دەردەکەوێ 2 سەگی شوانی رەگەز ئەوسترالیایی ◌ کلپی

**kelson** /'kɛls(ə)n/ = keelson

**kelt** *noun*

ماسی‌یە خاتوونە trout یان سەلمون salmon پاش گەراخستن و بەرلە گەرانەوەیان بۆ دەریا ◌ کلت

**kelter** /'keltə(r)/ *noun*, also kilter

ڕێکی، خشتی، ڕێک‌وپێکی ◌ انتظام

**kelvin** /'kelvɪn/ *noun*

کێلڤین (یەکەی جیهانی پێوانی تێمپراچێر، ئاو لە 273/15 ژێرسیفر دەیبەستێ و لە 373/15 دەکولێ، کورتە: K) ◌ کلوین

**kelvin scale** *noun*

پێوەری کێلڤین ◌ مقیاس کلوین

**kemp** /kemp/ *noun*

موو یان خوری زبر ◌ مو یا پشم زبر

**Kemp's ridley** *noun*

جۆرێ ڕەقەی دەریایی بچوکی بۆر ب.ت. هی کەنداوی مەکسیک و کەناری ئەتلانتیکی ئەمریکا [*Lepidochelys kempii*] ◌ نوعی لاک‌پشت

**kempt** *adjective*

ڕێک، ڕێک‌وپێک، خشت ◌ مرتب، منظم

**ken**[1] /ken/ *noun*, beyond one's ken

لێ‌تێنەگەیشتوو، لە دەرەوەی زانیاری (کەسێ) ◌ بیرون از فهم

**ken**[2] = know

**kenaf** /kə'naf/ *noun*

گوش، گیاگوش ◌ کنف

**Kendal Green** /'kɛnd(ə)l/ *noun*

1 جۆرێ کوتاڵی زبری بە ڕەنگی سەوزی لەخوری 2 ڕەنگی سەوزی ئەو کوتاڵە (بنەڕەت: لە ناوی *Kendal* لە Cumbria، لە باکووری ڕۆژاوای ئینگلتەرە، 7055 کیلۆمیتری چوارگۆشە، 2724 مایلی چوارگۆشە، حەشیمەت 486,900) ◌ کندال گرین

**kendo** /'kendəʊ, US -doʊ/ *noun*

کێندۆ (شێوەیەکی ژاپۆنی وەرزشی شمشێربازی، شمشێرێکی داری سووک؛ بنەڕەت: ژاپۆنی: *ken* "شمشێر" + *dō* "ڕێگا، شێوە") ◌ کندو

**kendoist** *noun*

کێندۆئیست، کێندۆباز ◌ کندوئیست

**kennel** /'kɛnl/ *noun*

1 کونەسەگ، کولانەسەگ 2 (kennels) شوێنی زاوزێ یان بەخێوکردنی سەگ 3 (خوازە) کۆختە، کونەسەگ 4 گەڵەسەگ ◌ 1 لانەی سگ 2 کنل 3 کلبه 4 دسته سگ

**Kennelly layer**, also Kennelly–Heaviside layer = E-layer

**kennelmaid** *noun*

ژنێ کە لە kennels دا کار دەکا ◌ کنلماید

**kennelman** *noun*, *pl.* kennelmen

پیاوێ کە لە kennels دا کار دەکا ◌ کنلمن

**kenning** *noun*

1 واتای خوازەیی یان میتافۆریکال لە هەڵبەستی ئینگلیسی کۆن و نۆرویژی کۆندا (وەکوو "oar-steed" بۆ کەشتی ship) 2 زانیاری، زانست، زانایی 3 هەتەر، توانایی بینین ◌ 1 کنینگ 2 دانش 3 قدرت بینایی

**keno** /'kiːnəʊ/ *noun*

جۆرێ کایە، شێوەی bingo دەدا ◌ کنو

**kenspeckle** /'kɛnˌspɛk(ə)l/ *adjective*

(سکاتلەندی) دیار، بەرجەستە، ڕوون، ئاشکرا، ڕاشکاو، زوو دەناسرێتەوە، بەرچاو ◌ مشهود، هویدا، معلوم، مشخص، واضح

**kent** = past of kent

**kente cloth** *noun*, also kente

جۆرێ کوتاڵی ڕەنگین، لە گانا بە دەس دەچنرێ ◌ نوعی پارچه

**kentia palm** *noun*

جۆرێ دارخورمای ئەوسترالیایی، وەک ڕووەکیماڵەوەش باوە [*Howeia (formerly Kentia) forsteriana*] ◌ نوعی درخت

**Kentish** /'kentɪʃ/ *adjective*

سەربە شاری Kent ی ئینگلتەرە ◌ وابسته به شهر کنت انگلستان

**Kentish glory** *noun*

جۆرێ moth ی خاڵ‌سپی و قاوەیی مەیلەو پرتەقاڵی زلە [*Endromis versicolora*] ◌ نوعی پروانه

**kentledge** /'kentlɪdʒ/ *noun*

ئەو قورس و سەنگە ئاسنانەی کە لە تەرکی کەشتی دایدەنێن ◌ کنتلد

**Kentuckian** /kɛn'tʌkiən/ *noun, adjectibe*

*n* کینتوکیایی، خەڵکی هەرێمی کینتوکی Kentucky ئەمریکا *adj* سەربە یان پێوەندی بە کینتوکی‌یەوە هەیە ◌ کنتوکیایی

**Kentucky bluegrass** *noun*

مێرگ یان چیمەنی کینتوکی [*Poa pratensis*] ◌ کنتلد

**Kentucky coffee tree** *noun*

جۆرێ داری درێژی ئەمریکای باکووری کە لە جیاتی قاوە بەکاردێنرێ [*Gymnocladus dioica*] ◌ نوعی درخت

**Kentucky riffle** *noun*

جۆرێ تفەنگی سەرپڕ، لە سەدەی هەژدەیەم دا لە پێنسیلڤانیا پەرەی پێدرا و زۆرتر لە سنوورەکانی ئەمریکا بەکاردێنرا ◌ نوعی تفنگ

**Kenyan** /'kɛnjən/ *adjective, noun*

*adj* سەربە کنیا یان کێنیا یان کینیا، کینیایی *n* خەڵکی کینیا، کینیایی ◌ *adj* کنیایی *n* اهل کنیا
**kepi** /ˈkeɪpi/ *noun, pl.* kepis
کێپی (= جۆرێ کڵاوی سەربازی فەرەنسی شەپکەراست) ◌ کپی
**Keplerian** *adjective*
کێپلێری، پێوەندی بە کێپلێرەوە هەیە (یوهان Johannes کێپلێر (1571-1630، ئەستێرەوانی ئەڵمانی) ◌ کپلری
**Keplerian motion** *noun*
(ئەستێرەوانی) جووڵە یان بزاوتی کێپلێری ◌ حرکت کپلری
**Keplerian orbit** *noun*
(ئەستێرەوانی) سوورگە یان خولگەی کێپلێری ◌ مدار کپلری
**Keplerian telescope** *noun*
(ئەستێرەوانی) دووربین یان تێلێسکۆپی کێپلێری ◌ تلسکوپ کپلری
**kept** /kept/ = past and past participle of keep
**kept woman** *noun*
دڵدار ◌ معشوقە
**Keralite** /ˈkɛrəlʌɪt, kəˈrɑːlʌɪt/ *noun, adjective*
*n* دانیشتوو یان خەڵکی هەرێم یان ستانی کێرالا Keralaی هیند *adj* سەربە یان پێوەندی بە کێرالاوە هەیە، کێرالایی ◌ کرالایی
**kerat(o)-** *prefix*
پێشگر: 1 سەربە کراتین یان شانەیێکی شاخی یان شاخئاسا 2 سەربە شاخینە یان رەقێنەی چاو cornea: *keratitis* 3 شاخ، شاخئاسا، وەکوو شاخ، شێوەشاخ (بنەرەت: لە -*keras, kerat* یۆنانی "شاخ horn") ◌ پیشوند: 1 وابستە بە کراتین یا بافت شاخی 2 وابستە بە قرنیە 3 شاخ، شاخمانند
**kerasine** /ˈkerəsɪn/ *adjective*
شاخی ◌ شاخی
**keratectomy** /ˌkɛrəˈtɛktəmi/ *noun, pl.* keratectomies
لابردنی بەشێ یا توێیەکی کۆرنیا ◌ کراتکتومی
**keratin** /ˈkerətɪn/ *noun*
شاخین، شاخینە، شاخە، مەتریاڵی شاخی، پرۆتێینێکی ریشاڵی کە پێکهێنەری سەرەکی موو، پەڕ، سم، چنگ و شاخە ◌ کراتین
**keratinization** *noun*
گۆڕین یان گۆڕان بۆ کێراتین یان شاخین ◌ کراتینیزاسیون
**keratinocyte** /ˌkɛrəˈtɪnə(ʊ)sʌɪt/ *noun*
خانەی epidermalی دروسکەری کراتین ◌ کراتینوسیت
**keratinous** *adjective*
شاخی، خاوەنی ماک یان مەتریاڵی شاخی ◌ دارای مواد شاخی
**keratitis** /ˌkɛrəˈtʌɪtɪs/ *noun*
ئاوسان یان هەوکردنی کۆرنیا ◌ التهاب قرنیه
**keratoid** /ˈkerətɔɪd/ *adjective*
شاخئاسا، شاخی، شێوەشاخ ◌ شاخمانند
**keratosis** /ˌkɛrəˈtəʊsɪs/ *noun,* keratoses
مێخەکە، رەقێتە یان ئەستووربوونی پێست، شاخیبوون ب.ت. پێست، کێراتۆز، کێراتۆسیس (keratotic *adj*: سەربە یان پێوەندی بە کێراتۆسیسەوە هەیە) ◌ کراتوز، کراتوسیس
**keratotomy** /ˌkɛrəˈtɒtəmi/ *noun, pl.* keratotomies
کۆرنیابڕی ◌ برش قرنیه
**kerb** /kɜːb, US kɜːrb/ *noun,* US curb
قاناو ◌ جدول
**kerb-crawler** *noun*
لە خانمگەڕاو، شۆفێری چاوحیز ◌ مزاحم خیابانی
**kerb-crawling** *noun*
لە خانم گەڕان، بە دوای ژن یان کچاندا کەوتن (پیاو و لەپاڵ شەقامدا و بە ماشێن) ◌ مزاحمت خیابانی
**kerb drill** *noun*
رێوشوێنی پەڕینەوەی لە شەقام، کۆمەڵە رێسای پەڕینەوە لە شەقام ◌ مقررات عبور از عرض خیابان
**kerbing** *noun*
قاناو ◌ جدول
**kerbside** /ˈkɜːbsaɪd, US ˈkɜːrb-/ *noun*
پاڵ یان قەراخ شەقام (نزیک بە قاناو) ◌ کنار خیابان
**kerbstone** /ˈkɜːbstəʊn, US ˈkɜːrbstoʊn/ *noun,* US curbstone
1 بەردی قاناو (پاڵ شەقام) 2 بەردچنی دەوری بیر ◌ 1 سنگ جدول 2 سنگچین دور چاه
**kerchief** /ˈkɜːtʃɪf, US ˈkɜːrtʃɪf/ *noun, pl.* same or kerchieves
یۆرتک، لەچکە، دەسماڵ، سەرووک، دەسرە، هێشار، سەرپۆش، دەسرۆکە، چەورۆکە ◌ روسری، دستمال
**Keres** /ˈkɛrɛs/ *noun, pl.* same
1 ئەندامی گەلی سوورپێستی Pueblo، دانیشتووی چەند بەشێکی نیومەکسیکۆ 2 زمانی ئەو گەلە ◌ کرس
**kerf** /kɜːf/ *noun*
براوی (جێی مشار) ◌ بریدگی
**kerfuffle** /kəˈfʌfl, US kərˈf-/ *noun*
ژاوەژاو، جەنجاڵی، شلوقی، هەراوهوریا، گۆنگەڵ، بگرەوبەردە، چەقەوهەرا، سرمەسرم، قاوقیژ، شلوقایی ◌ سر و صدا، هیاهو
**kermes** /ˈkɜːmɪz/ *noun*

رەنگی سوور (لە لەشی وشکەوەبووی مێروویێکی پوولەکەدار (*Kermes illicis*) کە گرێیێکی تووئاسا لەسەر kermes oak دەکا ◌ قرمزدانه

**kermes oak** *noun*

جۆرێ بەرووی هەمیشەسەوزی زۆر چکۆلەی مەدیتەرانەیی [*Quercus coccifera*] ◌ نوعی بلوط

**kermis** /'kɜ:mɪs/ *noun*

1 جەژن، سوور، ئاهەنگ (ساڵانە، لە هولەند و بێلژیک) 2 (ئەمریکا) ئاهەنگ یان جەژنێ ب.ت. بۆ خڕکردنەوەی پارە بۆ مەبەستی خێرخوازی ◌ 1 جشن 2 کرمیس

**kern**[1] /'kern/ *noun*

(لە چاپدا) گۆشە یان نووکی پیت ◌ کرن

**kern**[2] /'kern/ *noun*, also kerne

1 سەربازی پیادەی چەکسووکی ئیرلەندی 2 دیهاتی، لادێیی ◌ 1 کرن 2 روستایی

**kernel** /'kɜ:nl, US 'kɜ:rnl/ *noun*

1 کاکڵ، کرۆک، ناوک، ناو، توو، تۆو، دەنک: *a kernel of corn* 2 (خوازە) بەشی بنەرەتی، گەوهەر، کرۆک، بەشی ناوەندی یان سەرەکی ◌ 1 مغز، دانه 2 (مجازی) لب، قسمت اصلی

**kernite** *noun*

کێرنیت، کێرنایت: کانێکی بێ‌رەنگ کە لە بۆراتی ئاوداری سۆدیۆم پێکهاتووە ◌ کرنیت

**kerogen** *noun*

ماکێکی قیری تەلاشەبەردان، کاتێ گەرم داییێ نەوتی هەیە، کێرۆژێن ◌ کروژن

**kerosene** /'kerəsi:n/ *noun*, also kerosine

نەوت (سپی)، کێرۆسین، بە دڵۆپاندنی نەوت پەیدا دەبێ، paraffin oil ◌ نفت

**kerria** /'kerɪə/ *noun*

دەوەنێکی رۆژهەڵاتی ئاسیا، خێزانی rose [*Kerria japonica*] (لە ناوی باخەوانی ئینگلیسی (William *Ker(r)*) ◌ کریا

**Kerry** *noun, pl.* Kerries

کێری: جۆرێ مانگای رەشی چکۆلەی بەگوانی ئیرلەندی ◌ کری

**Kerry blue** *noun*

جۆرێ رەگەزی تاجی تووکبۆری شین ◌ نوعی سگ شکاری

**Kerry Hill** *noun*

جۆرێ مەڕی تیسکنی لاق و لمۆز خاڵاوی ◌ نوعی گوسفند

**kersey** /'kɜ:zi/ *noun*

جۆرێ کوتاڵی زبر و ڕێرلی ریشاڵکورت ◌ نوعی پارچه

**kerseymere** /'kɜ:zɪmɪə/ *noun*

کوتاڵێکی لەخوری نەرمونیانی تویلی ◌ کرزیمیر

**keskidee** /,keskɪ'di:/ = kiskadee

**kestrel** /'kestrəl/ *noun*

(گیانەوەرناسی) هەڵەکەسەما، هەڵەکە، مشکگرە [*Falco tinnunculus* (توراسیا و ئەفریکا)، *F. sparverius* (ئەمریکای باکووری) و جۆرەکانی تر] (لەوە دەچێ ناوی لە هەرا و قیژەکەی گیرابێتەوە) ◌ دلیجه

**ketamine** /'ki:təmi:n/ *noun*

کێتامین: دەرمانێکی ژانبڕ و بێهۆشکەر $C_{13}H_{16}ClNOyHCl$ ◌ کتامین

**ketch** /ketʃ/ *noun*

کێچ ( گەمییێکی بادەوەداری دووداراڵا) ◌ کچ

**ketchup** /'ketʃəp/ *noun*, also catchup, US also catsup

سۆسی باینجان (سرکە و هتد) ◌ سس گوجه‌فرنگی

**ketogenesis** *noun*

کێتۆژێنیز: بەرهەمهاتنی تەنە کێتۆنییەکان (وەک لە شەکرەدا) ◌ کتوژنیز

**ketogenetic** *adjective*

سەربە کێتۆژێنیز یان کێتۆژێنیسیس، پێوەندی بە کێتۆژێنیزەوە هەیە ◌ وابسته به کتوژنیز

**ketonaemia** /,ki:tə(ʊ)'ni:mɪə/ *noun*, US ketonemia

(پزشکی) بوونی تەنە کێتۆنێکی یەکجار زۆر لە خوێندا، کێتۆنیمیا، کێتۆنامیا ◌ کتونامیا

**ketone** /'ki:təʊn/ *noun*

(کیمیا) کێتۆن، کیتۆن: دەستەیێ لە ئاوێتە ئەندامییەکان کە کۆمەڵی کاربۆنیلیان تیایە، CO، بە دوو کۆمەڵی ئالکیلەوە نووساوە (ب.ت. ئەسیتۆن)، وەک $CH_3COCH_3$ ◌ کتون

**ketone bodies** *noun, pl.*

(زیندەکیمیا) تەنە کێتۆنییەکان: هەریەک لە سێ ئاوێتەی پێوەندیدار کە بە درێژایی میتابۆلیزمی چەورییەکان دێتەبەرهەم ◌ اجسام کتون

**ketonic** /kɪ'tɒnɪk/ *adjective*

(کیمیا) کێتۆنیک، کێتۆنی، سەربە کێتۆن، پێوەندی بە کێتۆنەوە هەیە ◌ کتونیک

**ketose** *noun*

(کیمیا) کێتۆز، کیتۆز: شەکرێ (وەک فرۆکتۆز) کە لە هەر گەردیکدا یەک کۆمەڵی کێتۆنی تیایە، مۆنۆساکاریدێ کە کۆمەڵێکی کێتۆنی تیایە ◌ کتوز

**ketosis** /kɪ'təʊsɪs/ *noun*

زۆربوونی تەنە کێتۆنییەکانی لەش، کێتۆز، کێتۆسیس ◌ کتوز، کتوسیس

**ketosteroid** *noun*

کێتۆستێرۆید: ستێرۆیدێ (وەک کۆرتیزۆن cortisone یان ئێسترۆن estrone) کە کۆمەڵێکی کێتۆنی تیایە ◌ کتواستروئید

**ketotic** *adjective*

سەربە زۆربوونی تەنە کێتۆنییەکانی لەش ◌ وابسته به کتوسیس

**kettle** /'ketl/ *noun*

1 کتری 2 = kettledrum 3 = kettle hole 4

**-** teakettle (بنـــەڕەت: لـــە *catillus* لاتـــین، چکۆلێنراوی *catinus* "bowl") ۞ کتری

**kettledrum** /ˈketldrʌm/ *noun*
دەهۆڵ، تەپڵ ۞ تیمپانی، نقارە

**kettledrummer** *noun*
دەهۆڵژەن، دەهۆڵکوت، تەپڵکوت، تەپڵژەن ۞ تیمپانیزن

**kettle hole** *noun*
(زەویناســـی) دیـــزەچـــاڵ: چاڵـــی لێـــزی کتریئاسایێکی قووڵ کە زۆرتر بە ئاو پڕبووەتەوە و بەهۆی تووانەوەی کەڵەکە سەهۆڵانەی کە پێشتر لەوێ بوون پێکهاتووە ۞ دیگچال

**kettle of fish** = mess

**Keuper** /ˈkɔɪpə/ *noun*
(زەویناســـی) زنجـــیرە بـــەردێکی نیـــشتووی ئەورووپایی سەردەمی ترپاسیکی Triassic دواتر (یان نوێتر. بنەڕەت: ئەڵمانی) ۞ کولار

**keV** *abbreviation* kilo-electronvolt(s)

**kevel** /ˈkɛv(ə)l/ *noun*
1 سنگ، مۆل (لە کەشتیدا) 2 دار ۞ 1 میخ چوبی 2 چوب

**Kevlar** /ˈkevlɑ:(r)/ *noun*
کێڤلار (= کەرەسەیەکی دەسکرد بۆ پتەوکردنی پێچکەی ماشێن و بەرهەمە جیرییەکانی تر) ۞ کولار

**Kewpie** *noun*
(دروشمی بازرگانی) جۆرێ بووکەڵەی پرچنی کوڵمن ۞ کوپای

**key**[1] /ki:/ *noun, adjective, pl.* keys
*n* 1 کلیـــل، کلیـــت 2 (ســـەعات) قـــورمیش 3 (کامپیوتێر) کلیل 4 (ماشێن) سویچ، دەستەکلیل، کلیل، دوگمە 5 (موسیقا) پەیژە، پەردە 6 راوێژ، ئـــاواز، شـــێواز 7 پـــواز، هـــۆرە 8 ڕێگاچـــارە، ڕێچـــارە، چـــارە، کارســـاز 9 بـــەردی ســـەرتاق، بەردی نێوەڕاست تاق، بەردی ناوتاق، بەردی ســـەرکەوانە *adj* کلیلـــی، گرنـــگ، ســـەرەکی، بنـــەڕەتی، بنگـــەهی، پێویـــست ۞ *n* 1 کلیـــد 2 (ساعت) کوک 3 (کامپیوتر) کلید 4 سویچ، شـــستی 5 (موسیقی) گام 6 آهنگ، لحن 7 گوه 8 راه حل 9 سنگ سرطاق *adj* کلیدی، مهم، عمده، ضروری

**key**[2] /ki:/ *noun*
(جوگرافیا) دوورگەی نزم یان شۆستە، ب.ت. لە کەناری فلۆریدا، دوورگەی شیلانی ۞ جزیـرەی پست، جزیرەی مرجانی

**keyboard** /ˈki:bɔ:d, US -bɔ:rd/ *noun*
کلیلگە، کلیلبەند، کەیبۆرد، تەختەکلیل، کلـیلان، ریزەکلیل ۞ صفحەکلید، ردیف کلاویەها

**keyboarder** /ˈki:bɔ:də(r), US -bɔ:rd-/ *noun*
کارپێکەری کامپیوتێر ۞ کیبوردر

**keyboarding** *noun*
کار (کردن) بە کلیلگە ۞ کار با صفحە کلید

**keyboardist** /ˈki:bɔ:dɪst, US -bɔ:rd-/ *noun*
کەسێ کە بـە کلیلگـە کایـە دەکا، کەیبۆردیـست ۞ کیبوردیست

**key card** *noun*
کارتی کلیلی ۞ کارت کلیدی

**keychain** *noun*
زنجیری کلیل ۞ زنجیر کلید

**keyed** *adjective*
کلیلدار، کلیلاوی، کلیلبەند ۞ کلیددار

**keyed up** *adjective*
ورووژاو، حەپەسـاو، هـەژیو، نگـەران، تـەنگاو، دڵلەدوا ۞ هیجانزدە، دلواپس

**keyholder** *noun*
کلیلڕاگر، کلیلەوان ۞ کلیدنگهدار

**keyhole** /ˈki:həʊl, US -hoʊl/ *noun*
جێکلیل، کونی کلیل یان کلیت، کلیر، کونی قفڵ ۞ سوراخ کلید

**keyhole saw** *noun*
مشار یا هەرەی کونەکلیلی ۞ ارەی سوراخکلیدی

**keyhole surgery** *noun*
نەشتەرگەری کونـەکلیلی، نەشـتەرگەری یـان برینکاری کونی چکۆلانە ۞ جراحی سوراخکلیدی

**key industry** *noun*
پیشەسازی کلیلی یان بنەڕەتی ۞ صنعت کلیدی

**key light** *noun*
شەوقی کلیلی، سەرچاوەی سەرەکی ڕووناکی، ڕووناکی بنەڕەتی (وێنە یا فیلمێ) ۞ نور کلیدی

**key map** *noun*
نەخشەی کلیلی یان بنەڕەتی ۞ نقشەی راهنما

**keymoney** *noun*
کلیلانە، کێیمانی ۞ سرقفلی

**Keynesian** /ˈkeɪnzɪən/ *adjective, noun*
*adj* ســـەربە تیـــۆرییـــەکانی ئـــابووریزانی ئینگلیـــسی John Maynard Keynes (1883-1946) *n* لایـەنگری تیـۆرییـەکانی کـەینز ۞ کینیزی

**keynote** /ˈki:nəʊt, US -noʊt/ *noun*
1 (موسیقا) نۆتی کلیلی یـان بنـەڕەت، بنکـە 2 بابەتی سەرەکی، مژاری بنەڕەتی ۞ 1 نت پایە 2 موضوع اصلی

**keynote address** *noun*
وتاردانی سەرەکی ۞ سخنرانی اصلی

**keynoter** *noun*
وتاردەری سەرەکی ۞ سخنران اصلی

**keynote speech** *noun*
وتاردانی سەرەکی ۞ سخنرانی اصلی

**keypad** /ˈki:pæd/ *noun*
کلیلگـــەی چکۆلـــە، تەختـــەکلیلی چکۆلـــە، کلیـلبەنـدی چکۆلانـە، (تەلـەفون) ژمـارەگری

دوگمەیی ◌ کیباد
**keypunch** = cardpunch
**key ring** *noun*
جیٚ‌کلیلی ◌ جاکلیدی
**key signature** *noun*
(موسیقا) ریبەری پەیژە، نیشانەی لێکدان ◌ علامت ترکیبی
**keystone** /ˈkiːstəʊn, US -stoʊn/ *noun*
1 بەردی سەرتاق، بەردی نیوەڕاستی تاق، بەردی ناوتاق، بەردی سەرکەوانە، بەردی تاج 2 بنەڕەت، بنچینە، بنەما، تەوەری سەرەکی ◌ 1 سنگ تاج 2 اساس، پایە، اصل
**keyway** *noun*
کونی کلیل، جیٚ‌کلیل ◌ سوراخ کلید
**keyword** /ˈkiːwɜːd, US -wɜːrd/ *noun*
وشەی کلیلی، وشەی سەرەکی، سەروشە ◌ واژەی کلیدی
**kg** *abbreviation* kilogram(s)
**KGB** /ˌkeɪ dʒiː ˈbiː/ *abbreviation* Komitet Gosudarstvennoi Bezopasnosti
کێی‌جی‌بی، کا.گێ.بێ (ئاژانسی هەواڵگری سۆڤیەتی جاران، دەزگای هەواڵگری شۆرەوی (لە 1953 وە) ◌ کا.گ.ب (سازمان اطلاعات شوروری)
**khadi** /ˈkadə/ *noun*, also khadder
کوتاڵێکی کەتانی دەس‌چنی هیندی ◌ کادی
**khaki** /ˈkɑːki/ *noun, pl.* khakis
1 قاوەیی مەیلەو زەرد، خاکی، بۆر 2 پارچەی بەو ڕەنگە (ب.ت. پارچە ئەرتەشی یان بۆ بەرگی سەربازی؛ بنەڕەت: لە *kāk* وەرگیراوە) ◌ 1 قهوەای مایل به زرد 2 لباس نظامی
**khakis** *noun*
پانتۆڵ یان شەڵواری لەو پارچەیە ◌ کاکیس
**khalif** *noun*
خەلیفە ◌ خلیفه
**khalifate** *noun*
خەلافەت ◌ خلافت
**Khalkha** /ˈkɑːlkə/ *noun, pl.* same or Khalkhas
1 ئەندامی بەشێ لە گەلی مۆنگۆلی، زۆرینەی دانیشتووانی مۆنگۆلیا پێکدێنن 2 زمانی کالکا، شێوەیەکی خۆماڵی مۆنگۆلیایی کە وەکوو زمانی فەرمی مۆنگۆلیا وەرگیراوە ◌ کالکا
**khamsin** /ˈkamsɪn/ *noun*
بای پەنجارۆژە: بایەکی گەرمی باشووری ڕۆژهەڵاتی یان باشووری کە لە میسر لە بەهاردا هەڵدەکا (بنەڕەت: لە *kamsīn* عەرەبی، لە *kamsūn* "پەنجا"، ڕۆژانی نێوان Easter و Pentecost) ◌ خمسین
**khan**[1] /kɑːn/ *noun*
خان (= لە هیندوستان، ئەفغانستان، ئاسیای ناوەندی و چەند وڵاتێکی مسوڵمانی تر) ◌ خان
**khan**[2] /kɑːn/ *noun*
خان، کاروان‌سەرا (لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا؛ بنەڕەت: لە *kān* ئێرانی‌یەوە) ◌ خان
**khanate** /ˈkɑːneɪt/ *noun*
مەڵبەندی (ژێردەسەڵاتی خان)، پلەوپایەی خانایەتی ◌ قلمرو خان، مقام خان
**khapra beetle** *noun*
ویران(کەر)ە: جۆرێ قالونچەی dermestid ڕەسەنی نیمچەکیشوەری هیند، بەڵایێکی زۆر ئاستەمە بۆ دەغڵی هەڵگیراو [ *Trogoderma granarium*] ◌ نوعی سوسک
**khat** /kɑːt/ *noun*, also qat or kat
1 گەڵاکانی دەوەنێکی عەرەبی کە وەک هانەدەرێ دەجاوێن 2 دەوەنی ئەو گەڵایانە [*Catha edulis*] ◌ کات
**Khazar** /kəˈzɑː/ *noun*
ئەندامی گەلێکی تورکیک کە بەشێکی زۆریان لە باشووری رووسیەدا لە سەدەکانی شەشەوە تا یازدە داگیرکرد ◌ خزر
**Khedival** /kɪˈdiːv/ *adjective*, also Khedivial
خەدیوی ◌ خدیوی
**Khedive** /kɪˈdiːv/ *noun*
خەدیو 1867-1914 (لەژێر دەسەڵاتی تورکەکاندا) ◌ خدیو
**Khmer** /kmɛː/ *noun*
1 خەڵکی ڕەسەنی شانشینی کمێر لە ڕۆژهەڵاتی باشووری ئاسیا 2 دانیشتووی ڕەسەنی کامبوجیا 3 زمانی کمێرەکان، زمانی فەرمی کامبوجیا، خمێر ◌ خمر، کمر
**kHz** *abbreviation* kilohertz
**Khoikhoi** /ˈkɔɪkɔɪ/ *noun*, also Khoi-khoin /-kɔɪn/, Khoi
کۆیکۆی: ئەندامی کۆمەڵێ لە گەلانی ڕەسەنی ئەفریکای باشووری و نامیبیا کە ناما Nama لەخۆدەگرێ ◌ کویکوی
**Khoisan** /ˈkɔɪsɑːn/ *noun*
1 کۆیسان: وشەیێ بۆ سەرجەم گەلانی سان و کۆیکۆی ئەفریکای باشووری 2 خێزانی زمانی ئەفریکای باشووری کە بریتین لە کۆیکۆی و سان San ◌ کویسان
**Khoja** /ˈkəʊdʒə/ *noun*
کۆجا: ئەندامی تیرەیەکی مسوڵمان، زۆربە لە ڕۆژاوای هیند ◌ کوجا
**khoum** /kuːm/ *noun*
کووم، کوم: یەکەی پارەی موریتانیا، بەرامبەر بە پەنجایەکی ouguiya ◌ کوم
**Khowar** *noun*
کووار: زمانێکی هیند و ئاریایی باکووری ڕۆژاوای پاکستان ◌ کووار
**khus-khus** /ˈkʌskʌs/ = vetiver

ســـەتڵ (بنـــەڕەت: لـــە *kaskas* فارســـی یـــان تۆردووەوە وەرگیراوە) ۞ سطل

**kiang** /kɪ'aŋ/ *noun*
کەرەکێوی ڕەگەز تەبەتی تووکزبر (لە *kyang* تەبەتی‌یەوە) ۞ کیانگ

**kibble** /'kɪbl/ *noun*
سەتڵ ۞ سطل

**kibbutz** /kɪ'bʊts/ *noun, pl.* kibbutzim /-'tsiːm/
کیبـــوتس، مووچەشـــەریکە، کێـــڵگەشەریکە (کێڵگەی هاوبەش لە ئیسرائیل‌دا) ۞ کیبوتس

**kibbutznik** /kɪ'bʊtsnɪk/ *noun*
ئەندامی کیبوتس ۞ عضو کیبوتس

**kibe** /kʌɪb/ *noun*
(کـۆن، ب.ت. لە پاژنەی پێ) قەڵەش، ترەک؛ هەروەها heel ۞ ترک

**kibitka** /kɪ'bɪtkə/ *noun*
کیبیتکـــا، ڕەشماڵـــی لمـــەدی (جـــاران هـــی تارتارەکان) ۞ کیبیتکا

**kibitzer** *noun*
خۆتێ‌هەڵقورتێن ۞ فضول

**kiblah** /'kɪblə/ = qibla

**kibosh** /'kaɪbɒʃ, US -bɑːʃ/ *noun,* put the kibosh on, also kybosh
تێ‌ڕیان، گووتێ‌کردن، خراپ‌کردن، شێواندن ۞ افتضاح

**kick**[1] /kɪk/ *noun*
1 لەقە، تیهەڵدان، شەق، زیچ، جووتە، شەپ، پێ‌لەقە 2 (چەک و تفەنگ) گەڕانەوە، تەکان 3 (نافەرمی) خۆشی، کەیف، سەرقاڵی، ڕابواردن 4 (نافەرمی) هێز، شیان، گیان، کاریگەری، باندۆر 5 (نافـەرمی) چـالاکی، دلبەستەیی، هـۆگری 6 (تۆپێن، ڕاگبی) لێدان بە پێ، تیهەڵدان بە پێ، بە پـێ لێـدان 7 (خواردنـەوە) تونـدی، بـەگیری 8 گلەیی، گناشت، پرتەوبۆڵە ۞ 1 لگد 2 (تفنگ) لگد 3 لذت، سرگرمی 4 (عامیانه) نیـرو. فعالیـت 5 (عامیانه) علاقەمندی 6 ضربه با پا 7 گیرایی 8 گله

**kick**[2] /kɪk/ *noun*
(کـۆن) بـەنێوداچوویی بنی بوتڵی شووشـە ۞ تورفتگی ته بطری

**Kickapoo** /'kɪkəpuː/ *noun. pl.* same or Kickapoos
1 ئەنـدامی گـەلی سوورپێـست، جـاران لـە ویسکۆنـسین Wisconsin دەژیـان و ئێـستا لـە کانـــساس Kansas، ئۆکلاهومـــا و بـــاکووری مێـــسکیکۆ دەژیـــن 2 زمـــانی ئالگۆنکویـــایی Algonquian ئەو گەلە ۞ کیکاپو

**kickback** /'kɪkbæk/ *noun*
1 بەرپەرچ‌دانەوەی توندوتیژانە 2 بەرتیل ۞ 1 جواب دندان‌شکن 2 رشوه

**kick-boxer** *noun*
کیک‌بۆکسێر ۞ کیک‌بوکسر

**kick-boxing** *noun*
کیک‌بۆکسینگ ۞ کیک‌بوکسینگ

**kicker** /'kɪkə(r)/ *noun*
1 (ئەسپ) جووتەهاوێژ، هەڵتلیزێنەر، هەڵتۆز، هەڵخەرەوە، لەقەخەر، جووتەخەر 2 تیهەڵدەر، تۆپ‌خەر ۞ 1 (اسب) لگدزن 2 لگدزن

**kicking-strap** *noun*
تاسمەی لووشکە (ناهێڵێ ئەسپی کالیسکە لووشکە بخا) ۞ کیکینگ استراپ

**kick-off** /'kɪk ɒf/ *noun*
1 دەس‌پێکردنی پێشبرکێی تۆپێن: *The kick-off is at 3* 2 لێدان یان تیهەڵدانی سەرەتای یاری ۞ 1 آغاز مسابقەی فوتبال 2 ضربەی شروع بازی

**kick-shaw** /'kɪkʃɔː/ *noun,* also kickshaw
1 ورکەوپرکە، شرەوشاتاڵ، gewgaw ،trinket 2 چێشتی خۆش، delicacy ۞ 1 خرت‌وپرت 2 غذای لذیذ

**kick-stand** /'kɪkstænd/ *noun*
(مۆتۆڕ و چەرخ) پایە، پێیە، ڕاگیرە ۞ پایه

**kick-start** *noun*
1 (هەروەها kick-starter، مۆتۆرسیکلێت) لەقە، هەندیل 2 (خوازە) جووڵە، تەکان ۞ 1 هندل 2 حرکت

**kick-starter** *noun*
(مۆتۆرسیکلێت) لەقە، هەندیل ۞ هندل

**kick-turn** *noun*
(لە سکی‌دا) نیوەچەرخ(وخول) نیوەسووڕانەوە ۞ نیم‌چرخش

**kickup** *noun*
بگرەوبەردە، شەڕوکێشە، شەڕ، مشت‌ومڕ ۞ کشمکش، دعوا

**kid**[1] /kɪd/ *noun, adjective*
*n* 1 منداڵ، زارۆک 2 کار، کاژیلە، گیسک، کارژۆلە، کاریلە 3 تیمانج، چەرم، کەوڵ *adj* چکۆلەتر (ئەڵمانی بنەڕەت) ۞ *n* 1 بچه 2 بزغاله 3 تیماج *adj* کوچک‌تر

**kid**[2] /kɪd/ *noun*
گاڵتە، شۆخی، گەمە ۞ تمسخر، ریشخند

**kid**[3] /kɪd/ *noun*
تەشتی دارین، تەبەک (دیسک، بەردولە، سوێنە: تەشتی قورین یان گلێنە؛ دۆلە: تەشتی دارین بۆ هەویر تیاشێلان) ۞ لاوک

**kid brother** *noun*
(نافەرمی) کاک، برای گەورەتر ۞ داداشی

**kidder** *noun*
فریودەر، لەخشتەبەر، بەکەرزان ۞ دست‌انداز

**Kidderminister carpet** *noun,* also Kidderminister
فـــەرشـــی ingrain (بنـــەڕەت: لـــە نـــاوی

*Kidderminster* ئینگلتەرە)◌ نوعی فرش
**kiddie** /kɪdi/ = kiddy
**kiddie-cam** *noun*
کیدیکام (کامێرا یان دووربینی چاودێری بەسەر منالاندا کاتێ دایکوباوک لە مال نین) ◌ کیدیکام
**kiddle** /ˈkɪd(ə)l/ *noun*
بناوان یان بەنداوی راوەماسی، بەنداوی تۆڕی ◌ سد ماهیگیری
**kiddy** *noun*
(نافەرمی) منال، زارۆک ◌ بچه
**kid-glove** /ˈkɪd glʌv/ *adjective*
1 پێی عارە کار بکا، گێرەنەکەر، دەس و پێسپیلکە، کارنەکەر، لە لووتی فیل کەوتوتەوە یان بەربۆتەوە 2 (kid gloves) دەسکێشی چەرمی (لە چەرمی کاژیلە) ◌ 1 از لای زرورق بیرون آمده 2 دستکش چرمی
**kidnap** /ˈkɪdnæp/ *noun*
مرۆڤ رفاندن، مرۆ(ڤ)دزی، هەلگرتن، فراندن، رفاندن (kidnapper /-æpə(r)/ *n*: رفێنەر، مرۆدز، هەلگر، بارمتەگر، مرۆڤرفێن) ◌ آدمربایی
**kidnapping** /ˈkɪdnæpɪŋ/ *noun*
مرۆڤ رفاندن، مرۆ(ڤ)دزی، هەلگرتن، رفاندن ◌ آدمربایی
**kidney** /ˈkɪdni/ *noun, pl.* kidneys
1 گورچیلە، ولک، خناوکە، کشتە: *a kidney infection* 2 سروشت، خوو 3 جۆر، ئاوا، رەنگ، نقش ◌ 1 کلیه، قلوه 2 مزاج 3 گونه، نوع
**kidney bean** *noun*
پاقلە، پاقلەسوورە، لوبیاسوورە ◌ لوبیا قرمز
**kidney dish** *noun*
(لە پزشکیدا) قاپ یان جێگای گورچیلەیی، دەفری شێوەگورچیلە ◌ ظرف کلیەمانند
**kidney machine** *noun*
دەزگای دیالیز یان گوچیلە(یی)، گورچیلەی دەسکرد ◌ دستگاه دیالیز
**kidney stone** *noun*
بەردی گوچیلە، چەوی ولک، a renal calculus ◌ سنگ کلیه
**kidney vetch** *noun*
پولکەولکانە، گیندەلەولکانە: جۆرێ گیای دانەویلەیی بژوێنی گولزەرد یان پرتەقالی [*Anthyllis vulneraria*] ◌ نوعی گیاه
**kid sister** *noun*
(نافەرمی) دادە، خوشکی گەورەتر ◌ آبجی
**kidstakes** /ˈkɪdsteɪkz/ *noun, pl.*
(نافەرمی) قسەی قۆر، هەلیتوپلیت ◌ حرف مفت، چرند
**kiekie** /ˈkiːkiː/ *noun*
(رووەکناسی) گیایەکی هەلچووی نیوزیلەند، بنەگەلاکانی دەخورێ [*Freycinetia banksii*]

◌ کیکی
**Kierkegaardian** /ˈkɪəkəˌgɑːdɪən/ *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە کارەکانی فیلسووف و دینەوانی دانمارکی Søren Aabye Kierkegaard (1813–55) هەیە ◌ کیرکگاردی
**kieselguhr** /ˈkiːz(ə)lˌgʊə/ *noun*
(ئەلمانی) جۆرێ diatomaceous earth کە بۆ بەرهەمهێنان یان پرۆسەی توێژینگەیی جۆراوجۆر بەکاردێت، زۆرتر وەک پالێونە، پرکەرەوە یان عایەق و ئینسولاتور ◌ کیسلگور
**kif** /kɪf/ = kef
**kike** /kaɪk/ *noun*
(لە ئەمریکای باکووری، بۆ سووکایەتی) جوو، جوولەکە ◌ جهود
**kikoi** /kɪˈkɔɪ/ *noun, pl.* kikois
جۆرێ کوتالی میلمیلی striped رۆژهەلاتی ئەفریکا (بنەرەت: لە Kiswahili) ◌ کیکوی
**Kikongo** /kɪˈkɒŋgəʊ/ *noun*
هەریەک لە دوو زمانی لێکچووی بانتۆیی کۆنگۆ و کۆماری دیمۆکراتیکی کۆنگۆ (زایری) و ناوچەکانی دەوروبەر ◌ کیکونگو
**Kikuyu** /kɪˈkuːjuː/ *noun, pl.* same or Kikuyus
1 ئەندامی گەلێ کە گەورەترین کۆمەلی رەگەزی کێنیا پێکدێنن 2 زمانی بانتۆیی ئەو گەلە 3 (kikuyu, kikuyu grass) گیایێکی خشۆکی سالانە، رەسەنی کێنیا [*Pennisetum clandestinum*] ◌ کیکویو
**kilderkin** /ˈkɪldəkɪn/ *noun*
کوپێ بۆ ئاو و شتی تر (16 یان 18 گالۆن دەگرێ) ◌ کیلدرکین
**kilim** /kɪˈliːm, US ˈkiːlɪm/ *noun.* also kelim
بەرە (بە رێگای تورکەوە، لە *gelīm* فارسییەوە، تەشکەبەرە: بەرەی درێژۆکە) ◌ گلیم
**kill**[1] /kɪl/ *noun*
1 کوشتن 2 (گیانەوەری) راو(کراو): *lions feeding on their kill* 3 هەلتەکاندنی فڕۆکەی دوژمن، ژێردەریایی و هتد ◌ 1 قتل 2 شکار 3 کیل
**kill**[2] /kɪl/ *noun*
چۆم، چەم، رووبار، creek ،channel، ب.ت. لە ناوی شوێندا ◌ رود
**killdeer** /ˈkɪldɪə/ *noun, pl.* same or killdeers
(بالندەناسی) جۆرێ ploverی بەربلاوی ئەمریکا، بە دەنگی خەماوییەوە [*Charadrius vociferus*] ◌ نوعی مرغ باران
**killer** /ˈkɪlə(r)/ *noun*
1 پیاوکوژ، بکوژ، کوژەر، کوژندە، فەوتێنەر، مایەی مردن یا مەرگ 2 گیانەوەری در(ندە) یان راوی 3 پڕمەترسی، زیانـاوی، کوشندە 4 (لە

لیکدانا) ـکوژ ۞ 1 قاتل، عامل مرگ 2 حیوان درنده 3 خطرناک، کشنده 4 ـکش

**killer cell** *noun*
خانەی کوشندە یان فەوتێنەر (کە خانەی شیرپەنجاوی دەکوژێ)، هەریەک لە جۆرەکانی lymphocyte یان leukocyte ـەکان کە دەتوانن ئەو خانانە بفەوتێنن کە تایبەتمەندی بێگانەیی‌یان وەرگرتووە ۞ یاختەی قاتل

**killer instinct** *noun*
ئینستینکت یان غەریزەی کوشتن، بێ‌بەزەیێتی، بێ‌رەحمی، درندەیی ۞ غریزەی کشتن، سنگدلی، قساوت

**killer T cell** *noun*, also cytotoxic T cell
خانەی T ئاسای کوشندە: خانەیێکی کوشندە کە تەنیا خانە مەبەستەکان دەفەوتێنێ (ب.ت. کاتێ لە لایەن خانە یاریدەدەرەکانی تی‌یەوە چالاک کرابێ، بڕوانە natural killer cell) ۞ کیلر تی سل

**natural killer cell** *noun*
خانەی کوشندە یان فەوتێنەری سروشتی: خانەیێکی چکۆلەی کوشندە کە خانە ڤایرۆس‌گرتووەکان یان خانە تومۆرییەکان دەفەوتێنێ (بەبێ چالاکاندنی خانە یان ئانتی‌بادی‌یێکی دەزگای پاراستن، بڕوانە killer T cell) ۞ کیلر تی سل

**killer whale** *noun*
(گیانەوەرناسی) نەهەنگی کوشندە یان کوژەر، نەهەنگی گۆشت‌خۆر [*Orcinus orca*] ۞ وال قاتل

**killick** /ˈkɪlɪk/ *noun*
1 لەنگەری بەردین 2 لەنگەرچە، لەنگەرۆکە ۞ 1 کیلیک 2 لنگر کوچک

**killifish** /ˈkɪlɪfɪʃ/ *noun, pl.* same or killfishes
جۆرێ ماسی، ڕەسەنی ئەمریکا [خێزانەکانی Cyprinodontidae و Poeciliidae: زۆر جۆرن] ۞ نوعی ماهی

**killing** /ˈkɪlɪŋ/ *adjective, noun*
*adj* 1 کوشندە، کوژندە، مرۆک، دەکوژێ 2 شەکەت‌کەر، ناخۆش، ماندووکەر 3 پێکەنینی، گاڵتەجاڕ، ولـکبڕ *n* کوشتن، کوشت، قەتڵ (killingly *adv*: یەکجار، لە ڕادەبەدەر) ۞ *adj* 1 کشندە 2 خستەکنندە 3 خندەدار *n* قتل

**killing field** *noun*, usu. killing fields
قڕگە، قڕانگە، شوێنێ کە خەڵـکانێکی زۆر کوژراون یان تیاچوون، شوێنی کۆمەڵکوژی، کوشتارگا ۞ مکان قتل عام

**killing zone** *noun*, also kill zone
ناوچەی مەرگ ۞ منطقەی مرگ

**killjoy** /ˈkɪldʒɔɪ/ *noun*
خۆشی‌بەر، سەرەخەر، خۆشی‌تێکدەر، ملۆزم ۞ آینەی دق، خرمگس معرکە

**kiln** /kɪln/ *noun*
کوورە، کڵ، کڵدان، ئەتوون، توون (بنەڕەت: لە لاتین *culina* "kitchen") ۞ کورە

**kiln-tax** *noun*
کلانە ۞ مالیات فخاری

**kilo** /ˈkiːləʊ, US ˈkiːloʊ/ *noun, pl.* kilos
1 کیلۆ، کیلۆگرەم 2 وشەکۆدی دەرخەری پیتی K لە پێوەندی ڕادیۆیی‌دا بەکاردێتێ (لە فەرەنسەوە، کورتەی *kilogramme*) ۞ کیلو

**kilo-** /ˈkɪləʊ, US ˈkɪloʊ/ *prefix*
پێشگر: کیلۆ، هەزار: *kiloton kilolitre* (بنەڕەت: بە ڕێگای فەرەنسەوە لە *khilioi* یونانی "هەزار") ۞ پیشوند: کیلو

**kilobar** *noun, abbreviation* kb.
کیلۆبار، هەزاربار، یەکەی گوشار یان پەستان بەرامبەر بە 1000 بار یان 100 megapascal ۞ کیلوبار

**kilobase** *noun, abbreviation* kb
(بۆ دەربڕینی درێژی گەردەکانی nucleic acid)، هەزارباز؛ یەکەیێ بۆ درێژی کرۆمۆزۆم، بەرامبەر بە 1000 جووت nucleoid ۞ کیلوباز

**kilobit** /ˈkɪləbɪt/ *noun*
کیلۆبیت، هەزاربیت (یەکەی پێوانی زانیاری یان یادەوەری کامپیوتێر بەرامبەر بە 1024 بیت) ۞ کیلوبیت

**kilobyte** /ˈkɪləbaɪt/ *noun*
کیلۆبایت، هەزاربایت (یەکەی پێوانی زانیاری کامپیوتێر بەرامبەر بە 1024 بایت، کورتە: Kb یان KB) ۞ کیلوبایت

**kilocalorie** *noun*
هەزارگەرمۆکە، کیلۆکالۆری ۞ کیلوکالری

**kilocycle** /ˈkiːləʊsaɪkl/ *noun*
هەزارخول یان سووڕ لە چرکەدا، هەزار هێرتس، هەزار هێرتز، کورتە: kc ۞ کیلوسیکل، کیلوهرتز

**kilogram** /ˈkɪləgræm/ *noun*, also kilogramme
کیلۆ، کیلۆگرەم، هەزارگرەم، کورتە: kg ۞ کیلوگرم

**kilohertz** /ˈkɪləhɜːts, US -hɜːrts/ *noun*
هەزارهێرتس، هەزارهێرتز، کیلۆهێرتس، کورتە: kHz ۞ کیلوهرتز

**kilojoule** /ˈkɪlədʒuːl/ *noun*
کیلۆژول، هەزارژول (ئەو بڕە وزەیە کە لە خۆراک بە دەست دێ، کورتە: kJ) ۞ کیلوژول

**kilolitre** /ˈkiːləʊlɪtə(r)/ *noun*, US kiloliter
هەزارلیتر، کیلۆلیتر، کورتە: kl ۞ هزار لیتر

**kilometre** /ˈkɪləmiːtə(r), BrE also kɪˈlɒmɪtə(r), US kɪˈlɑːm-/ *noun*, US kilometer
هەزارمیتر، کیلۆمیتر، کورتە: km ( kilometric *adj*) ۞ کیلومتر

**kiloton** *noun*, also kilotonne
هەزارتۆن، کیلۆتۆن ◌ کیلوتن
**kilovolt** *noun*
هەزارڤۆلت، کورتە: kV ◌ کیلوولت
**kilowatt** /ˈkɪləwɒt, US -wɑːt/ *noun*
هەزاروات، کیلۆوات، کورتە: kW ◌ کیلووات
**kilowatt-hour** *noun*
هەزارواتسەعات، کیلۆواتسەعات، کورتە: kWh ◌ کیلوواتساعت
**kilt** /kɪlt/ *noun*
کیلت (= داوێنی سکاتلەندی کە وەکوو بەشێ لە نەریتی ئەوێنە لەبەر دەکرێ) ◌ کیلت
**kilted** /ˈkɪltɪd/ *adjective*
1 کیلتلەبەر، کیلتپۆش 2 هەڵکردوو، دراوەسەرێ 3 چیندار، گنجدار، چینچین ◌ 1 کیلتید 2 بالازده 3 دارای چین
**kilter** /ˈkɪltə(r)/ = kelter
**kilting** *noun*
چین، گنج، چرچ (لە داوێندا) ◌ چین
**kimberlite** /ˈkɪmbəlʌɪt/ *noun*
بەردێکی گڕکانی intrusiveی دەنکزبری تێکەڵ بە شینی دەگمەن، جاروبار رووژە یان ئەڵماسی تیایە، لە باشووری ئەفریکا و سیبیریا دۆزراوەتەوە (بنەڕەت: لە ناوی Kimberley شارێکی ئەفریکا) ◌ کیمبرلیت
**Kimbundu** *noun*
کیمبوندو: زمانێکی بانتۆیی باکووری ئانگۆلا Angola ◌ کیمبوندو
**kimchi** /ˈkɪmtʃi/ *noun*
کیمچی (= چێشتی نەتەوەیی کۆریا) ◌ کیمچی
**kimono** /kɪˈməʊnəʊ, US kɪˈmoʊnoʊ/ *noun, pl.* kimonos
کیمۆنۆ (= جلوبەرگی خۆماڵی ژاپۆنی، زۆرتر لە ئاهەنگی تایبەتیدا لەبەر دەکرێ، kimonoed *adj*) ◌ کیمونو
**kin** /kɪn/ *noun*
کەسوکار، خزموکەس، قەوموخێش (kinless *adj*) ◌ خویشان
**-kin** *suffix*
پاشگر: ناوی چکۆلینراو دروست دەکا: *catkin* ◌ پسوند: اسم مصغرساز
**kina**[1] /ˈkiːnə/ *noun, pl.* same
یەکەی بنەڕەتی پارەی Papua New Guinea، بەرامبەر بە سەد toea ◌ کینا
**kina**[2] /ˈkiːnə/ *noun. pl.* same
جۆرێ urchinی خۆراکی دەریایی، هی کەنارەکانی نیوزیلەند [*Evechinus chloroticus*] (بنەڕەت: لە مائۆرییەوە) ◌ کینا
**kinaesthsia** /ˌkɪnɪsˈθiːzɪə, ˌkʌɪn-/ *noun*, US kinesthesia, *pl.* kinaesthsias or kinaesthses
هەست(کردن)ی جووڵە یان جووڵان، ئاگاداری یان ئاگایی لە بارودۆخ و جووڵانی بەشەکانی لەش بەهۆی ئەندامە هەستییەکان (proprioceptor ەکان) لە ماسوولکە و جومگەکاندا (kinaesthetic *adj*، kinaesthetically *adv*) ◌ احساس حرکت
**kinase** /ˈkʌɪneɪz/ *noun*
(زیندەکیمیا) کیناز: هەوێنەیێ کە راگوێستنی کۆمەڵی فۆسفات phosphate group لە ATPەوە بۆ گەردیلەیەکی تایبەت ئاودەدا ◌ کیناز
**kincob** /ˈkɪŋkɒb/ *noun*
جۆرێ پارچەی هێندی پڕنەخش و نیگار (بە زێڕ و زیو) ◌ کینکوب
**kind**[1] /kaɪnd/ *adjective*
میهرەوان، دڵسۆز، دڵنەرم، دڵۆڤان، بەبەزەیی، بەڕەحم، بێکینە، دڵسۆزانە، بەبەزەییانە، دۆستانە: ◊ *a very kind and helpful person* ◊ *a kind heart/face* ◌ مهربان، شفقت‌آمیز
**kind**[2] /kaɪnd/ *noun*
1 جۆر، چەشن، ئاوا، سان، نفش، دەستە، بابەت، چین: *music of all/various/different kinds* ◊ *Exercises of* ◊ *three kinds of cakes/cake* ◊ *this kind are very popular* 2 چۆنیەتی، باشی 3 سروشت، nature ،character :*the trials were different in kind from any that preceded them* (فرێز و زاراوەکان: in kind: 1 (پێدانی شتێک) بە شت، بە ماڵ، نە بە پارە: *As well as his salary, he gets benefits in kind* 2 بە هەمان شێوە، هەر بەو شێوە یان چەشنە: *She insulted him and he responded in kind* ◊ a kind of: جۆرێ، یەک جۆر، چەشنێک: *I had a kind of feeling this might happen* ◊ kind of (هەروەها kinda /ˈkaɪndə/): تا رادەیێ، نەختێ، کەمێ، برێک، slightly: *That made me feel kind of stupid* ◊ nothing of the kind/sort: شتێکی وا هەر لە گۆڕێدا نییە، عەسڵەن شتێکی وا نییە ◊ of a kind: هەر لەم جۆرە یان چەشنە ◊ of its kind: هەر لەو جۆرە یان چەشنەی خۆی، لە جۆری خۆیدا ◊ one of a kind: بێهاوتا، بێوێنە، بێچوون، unique: *My father was one of a kind—I'll never be like him* ◊ something of the/that kind: شتێکی وا، شتێک لەو مایەدا، شتێکی لەو دەوروبەرە: *'He's resigning.' 'I'd suspected something of the kind.'*) ◌ 1 نوع، گونه، گروه، طبقه 2 کیفیت 3 طبیعت
**kinder** /ˈkɪndə(r) US ˈkɪndər = kindergarten (informal)
**kindergarten** /ˈkɪndəgɑːtn/ -dərgɑːrtn/ *noun*

باخچەی منالان،ب خوێندگای منالان (بنەڕەت: لە ئەڵمانی‌یەوە) ۞ کودکستان

**kindergartener** *noun*

مامۆستای باخچەی منالان ۞ معلم کودکستان

**kind-hearted** /ˌkaɪnd ˈhɑːtɪd/ *adjective*

دڵسۆز، بەڕەحم، بەبەزەیی، دڵنەرم (kind-heartedly *adv*: دڵسۆزانە، بەڕەحمانە، بەبەزەیی‌یەوە، دڵنەرمانە؛ kind-heartedness *n*: دڵسۆزی، بەبەزەیی، بەڕەحمی، بێ‌کینەیی، دڵنەرمی) ۞ رئوف

**kindling** /ˈkɪndlɪŋ/ *noun*

دەستەچیلە، پووش، پووشوو، پووشکە، قانگەلاشک، بناورە، چیلکە، چاوگە، ئاورگرە ۞ آتش‌زنە

**kindly**[1] /ˈkaɪndli/ *adverb*

بە دڵسۆزی(یەوە)، دڵسۆزانە ۞ با مهربانی

**kindly**[2] /ˈkaɪndli/ *adjective* (kindlier, kindliest)

دڵسۆز، دڵنەرم، بەڕوحم، بێ‌کینە، دڵۆڤان، بەبەزەیی، دڵسۆزانە، بەبەزەیی‌یانە (kindliness *n*: میرەوانی، دڵسۆزی، بەبەزەیی، بەڕەحمی، بێ‌کینەیی، دڵنەرمی) ۞ مهربان، محبت‌آمیز، شفقت‌آمیز

**kindness** /ˈkaɪndnəs/ *noun*

دڵسۆزی، بەبەزەیی، بەڕوحمی، دڵنەرمی، چاکانە، چاکە، باشی ۞ مهربانی، شفقت، لطف

**kindred** /ˈkɪndrəd/ *noun, adjective*

*n* 1 خزمایەتی، کەس‌وکاری، قەوم‌وخێشی، نزیکایەتی، پێوەندی خێزانی یان بنەماڵەیی 2 خزم‌وکەس، کەس‌وکار، قەوم‌وخێش *adj* هاوڕەچەڵەک، خزم، هاوڕەگ، هاوسەرچاوە، هاوزێدەر، پێوەندیدار، پێکەوەبەستراو، پێوەبەند، نزیک، هاوشێوە، لێکچوو: *a kindred spirit* ۞ *n* 1 خویشاوندی، قرابت 2 خویشاوندان *adj* هم‌خانوادە، وابستە، مشابە

**kindred spirit** *noun*

هاوڕیباز، هاوبیر ۞ هم‌مسلک

**kine** /kʌɪn/ *noun, pl.*

(کۆن) مێگەل، ران، گاڕان، گاگەل ۞ رمە، گلە، گاوها

**kinema** = cinema

**kinematic** /ˌkɪnɪˈmatɪk, US ˌkʌɪn-/ *adjective*, also kinematical

جوولەیی، بزاوتی، بزووتنەوەیی، سەربە بزاوتناسی، جوولەناسی‌یانە (-cally /-tɪk(ə)li, US ˌkʌɪn-/ *adv*) ۞ جنبشی، وابستە بە جنبش‌شناسی

**kinematics** /ˌkɪnɪˈmatɪks, US ˌkʌɪn-/ *noun, pl.*

بزاوتناسی، جوولەناسی، بزووتنەوەناسی (لقێ لە میکانیک کە دەربارەی بزووتنەوە یان جوولەی شتەکان دەکۆڵێتەوە کە کاری بە سەرچاوەی هێزی جوولەکەیان نییە؛ بڕوانە dynamics) ۞ جنبش‌شناسی

**kinematograph** /ˌkɪnɪˈmatəgrɑːf/ = cinematograph

**kinesiological** *adjective*

سەربە جوولەناسی لەش ۞ وابستە بە حرکت‌شناسی یا کینسیولوژی

**kinesiologist** *noun*

جوولەناس لە بواری لەشدا ۞ کینسیولوژیست، حرکت‌شناس

**kinesiology** /kɪˌniːsɪˈɒlədʒi, US kʌɪ-/ *noun*

زانستی جوولانی لەش، جوولەناسی لەش ۞ کینسیولوژی، حرکت‌شناسی

**kinesis** /kɪˈniːsɪs, US kaɪ-/ *noun, pl.* kineses

1 بزاوت، جوولە، جوولانەوە، بزووتنەوە، movement، motion 2 (زیندەناسی) جوولانی ناڕاستەوخۆی خانە یا زوورە cell، زیندەوەر یان بەشێ لە کاردانەوەیێ سەبارەت بە هاندەرێکی دەرەکی 3 (گیانەوەرناسی) جم‌وجۆڵی ئێسکەکانی کەڕاکە skull وەک هی هێندێ باڵندە یان خشۆک (بنەڕەت: لە یونانی *kinēsis* "جوولە") ۞ 1 جنبش 2 و 3 کینسس

**kinesthesia** = US spelling of kinaesthesia

**kinetic** /kɪˈnɛtɪk, US kaɪ-/ *adjective*

1 جوولەیی، بزووتنەوەیی، بزاوتی 2 سەربە هونەری جوولەیی (-netically *adv*: لەباری جوولەیی(یەوە)) ۞ 1 جنبشی، حرکتی 2 کنتیک

**kinetic art** *noun*

هونەری بزووتنەوەیی یا جوولەیی ۞ هنر جنبشی

**kinetic energy** *noun*

وزەی جوولەیی، وزەی بزووتنەوەیی، وزەی بزاوتی، جوولەوزە (بڕوانە potential energy) ۞ انرژی جنبشی

**kinetic equilibrium** *noun*

لەنگەری جوولەیی، هاوکێشەی بزووتنەوەیی یان جوولەیی، هاوسەنگی جوولەیی ۞ تعادل سینیتیکی

**kinetic stability** *noun*

جێگیری جوولەیی یان بزووتنەوەیی ۞ پایداری جنبشی

**kinetics** /kɪˈnɛtɪks, US kʌɪ-/ *noun, pl.*

جوولەناسی، بزاوتناسی ۞ جنبش‌شناسی

**kinetic temperature** *noun*

گەرمی یان تیمپراچێری جوولەیی یان بزواتی ۞ دمای جنبشی

**kinetic theory** *noun*

بیردۆز یان تیۆری جوولەیی ۞ نظریەی جنبشی

**kinetin** /ˈkʌɪnɪtɪn/ *noun*

ناوێتەیێکی دەسکردی هاوشێوەی kinin، بۆ

هاندانی دابەش‌بوونی خانەیی cell division رووەک و گیا بەکاردیتریَ ◌ کینتین

**kinetochore** /kɪˈniːtəʊkɔː, kaɪ-/ = centromere

**kinetoplast** *noun*

ئەندامژەییێ کە DNA تیایە ب.ت. هی تریانۆسۆمەکان ◌ کینتوپلاست

**kinetoscope** /kɪˈniːtəʊskəʊp, US kaɪ-/ *noun*

جوولەبین، دەزگایێکی سەرەتایی بۆ بینینی ویتەکان لە کونێکەوە (کاتێ بخولێتەوە) ◌ کینتواسکوپ

**kinetosome** = basal body

**kinfolk** = kinsfolk

**king** /kɪŋ/ *noun*

1 پادشا، پاتشا، پاشا، قەڕال، شا 2 (شەترەنج، پەڕین و هتد) شا 3 کەل، بەهێز، بەدەسەلات، دەس‌ڕۆیشتوو 4 ب.ت. بۆ ناوی ئەو گیانەوەر و رووەکانە بەکاردیَ کە بە تایبەت گەورەن، ب.ن. king cobra ◌ 1 سلطان، پادشاه، شاه 2 شاه 3 قدرتمند، متنفذ 4 (در نامگذاری) شاه

**kingbird** /ˈkɪŋbɜːd/ *noun*

شامەل: قولەچەقەیەکی زۆرداری گەورە ئەمریکایی سەرشێنکی، بنەوەی سپی، زەرد یان بۆرە [*Tyrannus*: چەندین جۆرن] ◌ کینگبرد

**kingbolt** /ˈkɪŋbəʊlt/ = kingpin

**King Charles spanile** *noun*

جۆریَ رەگەزی spanile ی بچوک، بە تووکی رەش، سپی یان قاوەیی‌یەوە ◌ نوعی اسپانیل

**king cobra** *noun*

شاکوبرا [*Ophiophagus hannah*] ◌ شاەکبرا

**king crab** /ˈkɪŋ kræb/ *noun*

1 = horseshoe crab 2 شاقرژال: جۆرێکی خۆراکی پاسیفیکی باکووری، شێوەی قرژالی جالجالووکەیی spider crab دەدا [توخم *Paralithodes*] ◌ خرچنگ نعلی

**kingcraft** /ˈkɪŋkrɑːft/ *noun*

هونەری بەڕێوەبردنی ولات، ولاتگێریَ ◌ فن ادارەی کشور

**kingcup** /ˈkɪŋkʌp/ *noun*, also marsh marigold

گولە مێلاقە، رەبەنۆک، بووک، جوونگ، گولەبەهارە ◌ آلالە

**kingdom** /ˈkɪŋdəm/ *noun*

1 پاتشایەتی، پاتشایی، شایەتی: *the kingdom of God* (= heaven) 2 مەلبەندی دەسەلاتی پاتشایی 3 زنجیرە، جیهان، هەریەک لەو دابەش‌کردنە سروشتی‌یەی جیهان (گیانەوەر، رووەک و کانی‌یەکان): *the animal, vegetable and mineral kingdoms* 4 ناوچەی پیرۆز یان دەسەلاتی خودایی، پاتشایەتی مانایی 5 پاتایی، مەلبەند، رووبەر، شانشین 6 (زیندەناسی) شایەتی؟، سەرترین یان بەرزترین دەستە یا پۆلی لە پۆلاندنا (*n* /ˈkɪŋhʊd/ kinghood: شاییتی، پاتشایی، پادشایەتی؛ *adj* kingless: بێ‌شا، بێ‌پادشا، بێ‌پاتشا؛ *n* kingliness: شایانەبوون؛ *adj* /ˈkɪŋli/ kingly (kinglier, kingliest): شایانە، پاتشایی، ریگال؛ فریز و زاراوەکان: till/until kingdom come: تا هەتایە، هەتا هەتایە، تا دنیا بە دنیایە، بۆ هەمیشە، تا قاری قیامەت، تا ئەو رۆژەی قیامەت دەبێتەوە: *He'll talk till kingdom come if you let him*) ◌ 1 سلطنت 2 قلمرو پادشاه 3 عالم 4 ملکوت 5 قلمرو 6 (زیست‌شناسی) کینگدوم، فرمانرو

**King Edward** *noun*

جۆریَ پەتاتەی هێلکەیی oval تویکل‌سپی (بنەڕەت: لە ناوی *King Edward* حەوتەمەوە) ◌ نوعی سیب‌زمینی

**kingfish** *noun, pl.* same or kingfishes

(گیانەوەرناسی) شاماسی [*Scomberomorus cavalla* (خیزانی mackerel، رۆژاوای ئەتلانتیک) و جۆرەکانی تر] ◌ کینگفیش

**kingfisher** /ˈkɪŋfɪʃə(r)/ *noun*

(گیانەوەرناسی) قولەشینە، ماسیگرە، ماسیگر (ک) [*Alcedo atthis* و جۆرەکانی تر، خیزانی Alcedinidae] ◌ ماهی‌خورک

**King James Version** (King James or Bible) = Authorized Version

**kingklip** /ˈkɪŋklɪp/ *noun*

جۆریَ cusk-eel ی ناوەکانی ئەفریکای باشووری، وەک ماسی خۆراکی گرنگە [*Genypterus capensis*] ◌ نوعی ماهی

**kinglet** /ˈkɪŋlɪt/ *noun*

1 لاشا، پادشای چکۆلانە، قەڕالیچە، شاچە 2 جۆریَ باڵندەی کۆمەڵێکی زۆر چکۆلەی دەنگ‌خۆش کە goldcrest ـەکان دەگرێتەوە [توخم *Regulus*] ◌ 1 پادشاه کوچک 2 کینگلت

**kingmaker** /ˈkɪŋmeɪkə(r)/ *noun*

دەسەلات‌بەدەستی پشت‌پەردە یان لەپەنەوە، شادانەر، شاساز، شاگێر (ئاماژە بە ئێرل Warwick (1428-71)) ◌ سیاست‌گذار نهانی

**king of beasts** *noun*

(کۆن، ویژەیی) شێر ◌ شیر

**king of birds** *noun*

(کۆن، ویژەیی) هەڵۆ، ئەیلۆ ◌ عقاب

**King of Kings** *noun*

(لە کلێسەی کریستیەن) خودا ◌ خدا

**king of the castle** *noun*

شا یان پاتشای قەڵا (جۆریَ کایەی منداڵان بەم شێوەیە کە یەکێک لەسەر شتێک رادەوەستیَ و ئەوانی دیش هەوڵ دەدەن شوێنەکەی بگرنەوە. ئەو هۆنراوە نەریتی‌یە کە یاری‌زانی یەکەم لەویَدا دەیخوێننەوە ئەمەیە: *I'm the king of*

*And you're* "من پاتشای قەلاکەم" *the castle* "و تۆ خوێڕی‌یە گولەکەی" *the dirty rascal!* ۞ نوعی بازی بچەها

**king penguin** *noun*
پەنگوئەنی پاتشا: جۆرێکی زلە [*Aptenodytes patagonicus*] ۞ پنگوئن ساطان

**kingpin** /ˈkɪŋpɪn/ *noun*
1 شامیل، شاجەڕ، شاسنگ 2 (خوازە، کەس یان شتێ) مۆرەی سەرەکی، تەوەر، بنگەهی، بنەڕەتی، زۆرگرنگ ۞ 1 میل سگ‌دست 2 (آدم یا چیزی) بنیادی، رکن، بسیارمهم

**king post** /ˈkɪŋ pəʊst/ *noun*
شاکاریتە، شانیرگە، شادیرەک ۞ شاەتیر

**king prawn** *noun*
جۆرێ پراونی خۆراکی زلە [توخم *Penaeus*] ۞ نوعی شامیگو

**kin group** = kinship group

**King's Bench** *noun*
(لە بریتانیا) دادگای بالا، دادگای بەرز ۞ دیوان عالی

**King's Counsel** *noun*
(لە بریتانیا) پارێزەر، ئاوکات، ئەولەکار ۞ وکیل مدافع

**King's English** *noun*
ئینگلیسی پێوانە، ئینگلیسی ڕاست (ئەوەی کە لە بریتانیا قسەی پێ‌دەکرێ) ۞ انگلیسی معیار

**king's evidence** *noun*, turn king's evidence
ڕاستی لێوتن لە هاودەستانی خۆ، درکاندنی زانیاری لەبارەی هاودەستانی خۆوە بە مەبەستی سووک‌کردنی تاوان ۞ افشای اطلاعات شرکای جرم به منظور تخفیف جرم

**king's evil** *noun*, also scrofula
دەردەباریکە یا سیلی ڕژێنەی لیمفاوی مل، زەریکە، خەنازیر (باوەڕ وابوو کە بە دەس‌لێدانی پادشا سارێژ و چاک دەبووەوە) ۞ خنازیر

**kingship** /ˈkɪŋʃɪp/ *noun*
پاتشایی، پادشایی، شایەتی ۞ سلطنت

**king-sized** *adjective*, also king-size
گەورە، نائاسایی، ئاوارتە ۞ بزرگ

**king snake** *noun*
شامار: جۆرێ ماری ئەمریکای ناوەندی و باکووری [توخم *Lampropeltis*] ۞ نوعی مار

**kingwood** *noun*
شادار: داری چەندین درەختی گەرمێنانی ئەمریکا [ب.ت. توخم *Dalbergia*] ۞ نوعی مار

**kinin** /ˈkʌɪmɪn/ *noun*
1 (زیندەکیمیا) کینین 2 (ڕووەکناسی) ئاوێتەیێ کە پەرە بە دابەش‌بوونی خانەیی دەدا و ڕێ لە زووپیری ڕووەک دەگرێ ۞ کینین

**kink** /kɪŋk/ *noun*
1 تێک‌ئالان، تێک‌گیران، گیر، ئالۆسکان، لێک‌گیرکردن، قەفقەف‌بوون، قەف‌دان، پێچ، بادران، پێچ‌کەوتن، گرێ‌کەوتن، (قژ) لوولی 2 کێشەی دەروونی یان ئاکاری، گرێی دەروونی 3 ئاستەنگ، گیرەوکێشە، کێشە، کەم‌وکوری، عەیب ۞ 1 تاب، پیچ‌خوردگی، فر 2 مشکل روانی یا اخلاقی 3 مشکل، نقص، نارسایی

**kinkajou** /ˈkɪŋkəˌdʒuː/ *adjective*
میوەخۆرە: جۆرێ گوان‌دار کە کلکی زۆر بەگیرە، هی دارستانەکانی ئەمریکای باشووری و ناوەندی [*Potos flavus*] ۞ کینکاجو

**kinky** /ˈkɪŋki/ *adjective* (kinkier, kinkiest)
1 (قژ) لوول، فر، ئالۆسکاو، لێک‌ئالاو، لێک‌گیراو، پێچ‌کەوتوو 2 نائاسایی، سەیر (ب.ت. هەڵسوکەوتی سێکسی)؛ kinkily *adv*: بە شێوەیەکی لوول یان ئالۆسکاو، لێک‌ئالاوانە؛ kinkiness *n*) ۞ 1 فرفری 2 غیرعادی

**kinnikinnick** /ˌkɪnɪkɪˈnɪk/ *noun*, also kinnikinnic or kinnikinnik
کینیکینیک: شتێکە لە بری سیگار: تێکەڵەیێکی گەڵای وشکەوەبووی توتن یان سماق و توخڵی داربی یا دارسەگانە، سوورپێستەکان دەیکێشن) ۞ کینیکینیک

**kino** /ˈkiːnəʊ/ *noun*
کینۆ، کینۆ: جەوکی gum هیندێ داری گەرمێنان tropical، لە تاڵدان یان هەلاڵگەریدا tanning بەکاردێترێ ۞ نوعی صمغ

**kin selection** *noun*
(گیانەوەرناسی) هەڵبژاردنی خزمینە: شێوەیێکی هەڵبژاردنی سروشتی‌یە کە لایەنگری لە ڕەفتار و هەڵس‌وکەوتی ئەویدی‌خوازانە دەکا سەبارەت بە خزمە نزیکەکانی ۞ کین سلکشن

**kinsfolk** /ˈkɪnzfəʊk, US -foʊk/ *noun*, *pl.* also kinfolk
خزم‌وکەس، کەس‌وکار، قەوم‌وخێش، خلامی ۞ خویشاوندان

**kinship** /ˈkɪnʃɪp/ *noun*
خزمایەتی، کەسایەتی، نزیکایەتی، هاوشێوەیی، لێکچوویی: *the ties of kinship* ۞ خویشاوندی، قرابت، تشابه

**kinship group** *noun*
(مرۆڤناسی) دەستە یان کۆمەڵی خزمایەتی ۞ گروه خویشاوندی

**kinsman** /ˈkɪnzmən/ also kinswoman /ˈkɪnzwʊmən/ *noun*, *pl.* kinsmen or kinswomen
خزم، قەوم (پیاو)، خزم (ژن) ۞ خویشاوند

**kiosk** /ˈkiːɒsk, US -ɑːsk/ *noun*
بوتکە، دەکە، تەلەفونی گشتی (بنەڕەت: لە *köşk* "کۆشک" ەوە وەرگیراوە) ۞ کیوسک، باجه

**kip**[1] /kɪp/ *noun*
1 (بریتانیا) خەو، خەفن، سەرخەو، وەنەوز: *I*

*Why don't you have ◊ must get some kip a quick kip?* 2 (سکاتلەند) جێ‌خەو تەخت 3 (ئیرلەندی) شوێنی پیس ◊ 1 خەواب، چرت 2 جای خواب 3 مکان کثیف

**kip²** /kɪp/ *noun*
1 چەرم یان کەوڵی خۆش‌نەکراوی گوێلک، بەرخ یان ئەسپ 2 چەند تەختەکەوڵ، دەستەکەوڵ یان چەرم ◊ کیپ

**kip³** /kɪp/ *noun, pl.* same or kips
یەکەی بنەڕەتی پارە لە لائوس، بەرامبەر بە سەد at ◊ کیپ

**kipleather** = kip²

**Kiplingesque** /kɪplɪŋˈɛsk/ *adjective*
کیپلینگانە: بیرخەرەوەی بەرهەم و کاری نووسەری بریتانیایی Rudyard Kipling (1865–1936) ◊ کیپلینگسک

**kipper¹** /ˈkɪpə(r)/ *noun*
1 ماسی قاورمە(کراو)، ماسی وشکەوەکراو 2 ماسی سەلمونی نێر (لە سەروبەندی گەراخستن‌دا) ◊ 1 ماهی دودی یا نمک‌زده 2 کیپر

**kipper²** /ˈkɪpə(r)/ *noun*
لاوێکی رەسەنی ئەوسترالیایی کە پێی دەنێتە قۆناخی پیاوەتی‌یەوە ◊ کیپر

**kipskin** = kip²

**Kir** /kɪə(r), US kɪr/ *noun*
(دروشمی بازرگانی) کیەر (= خواردنەوەیێکی ئەلکۆلی کە بە تێکەڵ‌کردنی مەی سپی لەگەڵ کەسیس بە دەست دێ) ◊ کر

**Kirghiz** = Kyrgiz

**kirk** /kɜːk, US kɜːrk/ *noun*
(لە سکاتلەند) کێرک، کلێسە ◊ کلیسا

the **Kirk of Scotland** *noun*
کلێسەی سکاتلەند ◊ کلیسای اسکاتلند

**kirkman** *noun, pl.* kirkmen
پیاوی دینی یان ئەندامی کلێسەی سکاتلەند ◊ روحانی یا عضو کلیسای اسکاتلند

**Kirman** *noun,* also Kerman
فەرش یان مافوورەی کرمان (ناوی ستانێکی ئێرانە) ◊ فرش کرمان

**kirpan** /kəːˈpɑːn/ *noun*
شمشێرێکی چەماوەی کورت، وەک یەکێ لە پێنج نیشانەی جیاوازی Sikh Khasa پیادەکرێ ◊ کرپان

**kirsch** /kɪəʃ, US kɪrʃ/ *noun,* also kirschwasser /ˈkɪəʃvasə/
گێلاساو، کی‌یەرش (لیکۆرێکی بێ‌ڕەنگ کە لە گێلاس دروست دەبێ) ◊ کی‌ارش

**kirtle** /ˈkəːt(ə)l/ *noun*
1 (کۆن) کراسی قەسری یان درێژی ژنان 2 کەوای پیاوان ◊ کرتل

**kiskadee** /ˌkɪskəˈdiː/ *noun,* also keskidee
قولەچەقەی زۆرداری زلەی گەرمێنانی ئەمریکا [*Philohydor* و *Pitangus sulphuratus lictor*] ◊ نوعی مگس‌گیر

**Kislev** /ˈkɪslɛf/ *noun,* also Kislew
(لە رۆژمێری جوولەکەدا) سێیەمین مانگی ساڵ یان فەرمی و مانگی نۆیەمی ساڵی دینی (بنەڕەت: لە *kislēw* عیبری‌یەوە) ◊ کیسلف

**kismet** /ˈkɪzmet/ *noun*
چارەنووس، ناوچاوان (بنەڕەت: لە *ḳismat* عەرەبی‌یەوە) ◊ سرنوشت

**kiss** /kɪs/ *noun*
1 ماچ، لەونایش، راموسان 2 نوقل، غورابی یا کەیکێکی چکۆلانە 3 (بیلیارد و سنوکێر، بەحاڵ) لێکەوتن، بەرکەوتن ◊ 1 بوسە 2 و 3 کیس

**kissable** /ˈkɪsəbl/ *adjective*
ژیکەڵە، جوان، خنجیلانە ◊ دوست‌داشتنی

**kisser** /ˈkɪsə(r)/ *noun*
1 ماچ‌کەر 2 (نافەرمی) دەم، زار ◊ 1 بوسندە 2 دهن

**kissing bug** *noun*
جۆرێ مێرووی خوێن‌مژی ئەمریکای باکووری، زۆرتر بە دەم‌وچاوەوە دەنیشێ [*Melanolestes picipes*] ◊ نوعی حشرەی خون‌آشام

**kissing-comfit** /ˈkɪsɪŋ kʌmfɪt/ *noun*
نوقلی بۆن‌خۆش، شیرینی بۆن‌خۆش ◊ نقل معطر

**kiss of death** *noun*
گوورزی کوشندە، مایەی تێشکان (بێ‌ئەملاوئەولا) ◊ ضربەی مرگبار

**kiss of life** *noun*
هەناسە(پێ)دانی دەم‌بەدەم ◊ تنفس مصنوعی دهان به دهان

**kiss of peace** *noun*
ماچی ئاشتی، ماچێ بە نیشانەی یەکێتی برایەتی ◊ بوسەی آشتی

**kist** /kɪst/ *noun*
1 = cist 2 (ئەفریکای باشووری) سنووق ◊ صندوق

**Kiswahili** /ˌkiːswəˈhiːli, US ˌkɪswɑː-/ = Swahili

**kit¹** /kɪt/ *noun*
1 ساک، قوتو، جانتا، سنووق، ئامێردان، کۆڵ 2 سەتڵ 3 کەل‌وپەل، کیت (چەندین پارچە یان دەزگا کە هێشتا نەخراونەتە سەر یەک) 4 بارگەوبنە، باروبنە، تویشوودان، بوخچە، کەل‌وپەل (هی سەرباز یا رێبوار) 5 (بریتانیا) سنووق یان قرتالەیەکی گەورە (بۆ ماسی) 6 کۆمەڵێ شت یان مرۆ ◊ 1 کیف، کولەپشتی 2 سطل 3 لوازم، کیت 4 وسائل شخصی 5 و 6 کیت

**kit²** /kɪt/ *noun*
(مێژوویی) جۆرێ ڤیۆلینی چکۆلە و باریک ◊ نوعی ویولن کوچک

**kit³** /kɪt/ *noun*
1 بەچکە، بێچوو (ب.ت. هی مشکەخۆرە، سەگاو و مینک) 2 (نافەرمی) = kitten ۞ کیت

**kit⁴** /kɪt/ *noun*
تێکەڵەی زەفت، جەوک و پیو کە لە جاوی دەدەن ۞ کیت

**kitbag** /ˈkɪtbæg/ *noun*
(سەربازی) کۆڵ، بارەکۆڵ ۞ کولەپشتی

**kit-cat** *noun*
جاوی بە ئەندازەی ستاندارد (ب.ت. 28 × 36 ئینچ، 71 × 91.5 سانتیمیتر) بۆ پۆرترە یان وێنەی سەر، شان و دەست ۞ کیت‌کت

**kitchen** /ˈkɪtʃɪn/ *noun*
1 چێشت‌خانە، کلەر، ناومال، ئاشپەزخانە 2 (نافەرمی) بەشی ئامێرەکانی پیاکێشانی سازبەندی (بنەرەت: *cycene* ئینگلیسی کۆن، بنەرەت لە لمانی رۆژاوا، لە *coquere* لاتین "(چێشت)لێنان") ۞ 1 آشپزخانه 2 کیتچن

**kitchen cabinet** *noun*
(نافەرمی) دۆلاب یا کەوانتەر یا کابینێتی چێشت‌خانە ۞ کابینت آشپزخانه

**kitchener** /ˈkɪtʃɪnə(r)/ *noun*
1 (مێژوویی) کوورە یان چرای چێشت‌لێنان 2 چێشت‌کەر، ئاشپەز ۞ 1 بخاری یا چراغ خوراک‌پزی 2 آشپز

**kitchenette** /ˌkɪtʃɪˈnet/ *noun*
چێشت‌خانەی چکۆلە، ئاشپەزخانەی بچووک ۞ آشپزخانەی کوچک

**kitchen garden** *noun*
شینایی، بیستان، باخچە ۞ باغچه

**kitchen-maid** *noun*
دواناشپەز، ئاوەڵئاشپەز، ئاشپەزیار، بەردەستی چێشت‌لێنەر، بەردەستی ئاشپەز، بەرئاشپەز ۞ کمک‌آشپز

**kitchen midden** *noun*
کۆماپاشەرۆ(ک): کۆماپاشەرۆکێکی پێش‌مێژوو کە نیشانەی شوێنی نیشتەجێبوونی مرۆڤە سەرەتاییەکانە ۞ کیتچن میدن

**kitchen paper** *noun*
کاغزی چێشت‌خانە ۞ کاغذ آشپزخانه

**kitchen roll** *noun*
کاغزی چێشت‌خانە ۞ کاغذ آشپزخانه

**kitchen-sink drama** *noun*
شانۆی کرێکاری ۞ نمایش کارگری

**kitchen towel** = kitchen paper

**kitchenware** /ˈkɪtʃɪnweə(r), US -wer/ *noun*
کەلوپەلی چێشت‌خانە، شت‌ومەکی ئاشپەزخانە ۞ لوازم آشپزخانه

**kite** /kaɪt/ *noun*
1 بادەوە، کۆلارە، بەرزەحەوایلە، بادەوان، فڕۆنەک 2 (گیانەوەرناسی) کۆلارە، دال، کورکورە، کەلەگەور، مشکگرە [*Milvus milvus*] (سوورەکەی) و جۆرەکانی تر 3 (بریتانیا، نافەرمی) تەیارە، فڕۆکە 4 مرۆی (بە)دەغەل، زۆڵ، خوێڕی 5 (دەریاوانی، نافەرمی) = spinnaker ی 6 جۆری شێوەی چوارلایی کە جووتێ لە لاکانی یێک نزیکن (kitelike *adj*) ۞ 1 بادبادک 2 زغن 3 هواپیما 4 آدم متقلب 5 و 6 کایت

**Kitemark** /ˈkaɪtmɑːk, US -mɑːrk/ *noun*
کۆلارەنیشان، کایت‌مارک، نیشانەی ستاندارد (نیشانەیەکی فەرمی، لە کۆلارەیەکی چکۆلە دەچێ، لەسەر ئەو بەرهەمانە دادەنرێ کە لە لایەن دەزگای ستانداردی بریتانیاوە لەباری باشی و سلامەتی‌یەوە پەسند کراوە) ۞ کایت‌مارک

**kit fox** *noun*
(گیانەوەرناسی) ڕێوی شەورەو یان شەوگەڕ (باشووری رۆژاوای ئەمریکا [*Vulpes macrotis*]) ۞ کیت فوکس

**kith** /kɪθ/ *noun*. kith and kin
کەس‌وکار، دۆستان، دۆست و ناسیاو، ئاشنا و رۆشنا، خزم‌وکەس ۞ آشنایان، دوستان

**kithara** *noun, pl.* cithara
قیارە: جۆرێ ئامێری ژێداری یۆنانی کۆن ۞ قیثاره

**kitish** /ˈkɪtɪʃ/ *adjective*
چاوبرسی، نیرنەخۆر، بەهەڵپە ۞ حریص

**kitsch** /kɪtʃ/ *noun, adjective*
1 (هونەر یا دیزاین) هەرزان و بازاڕی، فشە، کاری بەزریقەوبریقە، کاری پڕوپووچ 2 بەزریقەوبریقە، بریقەدار ۞ 1 کار پرزرق و برق 2 پرزرق و برق

**kitschy** *adjective*
هەرزان و بازاڕی، بەزریقەوبریقە، پڕوپووچ، بریقەدار ۞ پرزرق و برق

**kitling** /ˈkɪtlɪŋ/ *noun*
1 بەچکە پشیلە، بێچووەپشیلە 2 منالی قۆشمە ۞ 1 بچه گربه 2 بچەی بازیگوش

**kitten** /ˈkɪtn/ *noun*
1 بەچکە یا بێچووەپشیلە، پشیلک، پشیلکە 2 تولە، بێچوو، بەچکە (هێندێ لە گیانەوەرانی تر وەکوو کەرویشک، سەگاو و هتد) ۞ 1 بچه گربه 2 بچه

**kittenish** /ˈkɪtnɪʃ/ *adjective*
1 وەکوو بەچکەپشیلە 2 (ژن) دلڕفێن، لەبار 3 قۆشمە، شەیتان، دەڵێی ودودە، دەڵێی بەچکە پشیلە ۞ 1 مانند بچەی گربه 2اغواگر 3بازی‌گوش

**kittiwake** /ˈkɪtɪweɪk/ *noun*
ماسیگرەی پێڕەش [*Rissa tridactyla*] ۞ کاکایی پاسیاه

**kittle** /ˈkɪt(ə)l/ *adjective*, also kittle-cattle

1 (کۆن) سەخت، گران 2 راڕا، وازیوازی ◌ 1 سخت 2 دمدمی

**kitty**[1] /ˈkɪti/ *noun, pl.* kitties
(بە زمانی منالان) پشی ◌ پیشی

**kitty**[2] /ˈkɪti/ *noun, pl.* kitties
1 سنووق، مجری 2 پارەی کۆوەکراو بۆ مەبەستێکی تایبەتی 3 پارەیێ کە براوەی پاستۆڕێن وەری دەگرێ ◌ 1 صندوق 2 پول جمعآوریشده برای منظور خاصی 3 کیتی

**kitty-cornered** = catty-cornered

**kiva** /ˈkiːvə/ *noun*
دیوێ ب.ت. ژێرخانێ لە لایەن سوورپێستانی Pueblo وە بۆ نەریت و سروتە دینییەکانیان religious rites بەکاردێرێ (لە Hopi *kiva*) ◌ کیوا

**Kiwanian** *noun, adjective*
ئەندامی یانەی راژەوانی کۆمەڵگا ◌ کیوانین

**Kiwanis Club** /kɪˈwɑːnɪs/ *noun*
(ئەمریکا) یانەی راژەوانی کۆمەڵگا ◌ کیوانیس کلوب

**kiwi** /ˈkiːwiː/ *noun, pl.* kiwis
کیوی: 1 باڵندەیێکی دەنووکدرێژی ڕەسەنی نیوزیلاند [توخم *Apteryx*: سێ جۆرن] 2 (Kiwi، نافەرمی) خەڵکی نیوزیلاند ◌ 1 کیوی 2 (با K) اهل زلاندنو

**kiwi fruit** *noun, pl.* same
کیوی: میوەی ڕووەکێکی هەڵچووی ئاسیای ڕۆژهەلات (*Actinidia chinensis*)، پێستتووکن، گۆشتسەوز و دەنکڕەش ◌ کیوی

**KJ** / *abbreviation* kilojoule

**KKK** /ˌkeɪ keɪ ˈkeɪ/ *abbreviation* Ku Klux Klan

**Klamath** /ˈklaməθ/ *noun, pl.* same or Klamaths
1 ئەندامی گەلی سوورپێستی سنووری ئۆریگۆن-کالیفۆرنیا 2 زمانی پینۆتیایی Penutian ئەو گەلە ◌ کلامات

**Klamath weed** *noun*
جۆرێ Saint John's wort چەندساڵەی گوڵزەردی ئەورووپایی [*Hypericum perforatum*] ◌ نوعی گیاه

**Klan** *noun*
ڕێکخراوەی کوکلاکسێرەکان ◌ سازمان کوکلوکسرها

**Klansman** *noun, pl.* Klansmen
ئەندامی Ku Klux Klan ◌ عضو Ku Klux Klan

**Klanswoman** *noun, pl.* Klanswomen
ئەندامی Ku Klux Klan (ژن) ◌ عضو Ku Klux Klan (زن)

**klatch** /klatʃ/ *noun,* also klatsch
کۆبوونەوە (خەڵک؛ بنەڕەت: لە *Klatsch* ئەڵمانی "gossip") ◌ اجتماع

**Klavern** *noun*
ئەندامی خۆجێیی Klan ◌ عضو بومی Klan

**klaxon** /ˈklæksn/ *noun,* also Klaxon, trademark
هۆڕنی ئێلیکتریکی (لە ناوی کۆمپانی بەرهەمهێنەرەکەیەوە): *The klaxon sounded and the crew prepared to dive* ◌ بوق الکتریکی

**klebsiella** /ˌklɛbzɪˈɛlə/ *noun*
بەکتریای توخمێ کە دەبێتە هۆی نەخۆشییەکانی هەناسە و میزەڕۆ [توخم *Klebsiella*] (بنەڕەت: لە ناوی باکتریۆلۆژیستی ئەڵمانی سەدەی 19 Theodore *Klebs*) ◌ کلبزیلا

**Kleenex** /ˈkliːneks/ *noun, pl.* same or Kleenexes
(دروشمی بازرگانی) دەسرەی کاغزی ◌ دستمال کاغذی

**klepht** /klɛft/ *noun*
1 شەڕکەری سەربەخۆی یۆنانی، ب.ت. کەسێ کە لە سەدەی 15 لە دژی تورکەکان شەڕی دەکرد 2 ڕێگر، چەتە، جەردە (بنەڕەت: لە *kleptēs* یۆنانی "دز"، لە بنەڕەتا کلێفتەکان یاخییانی شاخ بوون) ◌ 1 کلفت 2 راهزن

**klept(o)-** *prefix*
پێشگر: دزی: *kleptomania* ◌ پیشوند: دزدی

**kleptocracy** *noun, pl.* kleptocracies
دزەدەسەلاتداری (= گرتنی دەسەلات بۆ دزینی سەرچاوەکانی وڵاتەکەی) ◌ کلپتوکراسی

**kleptocrat** *noun*
دزەدەسەلاتدار ◌ کلپتوکرات

**kleptocratic** *adjective*
سەربە دزەدەسەلاتداری ◌ کلپتوکراتیک

**kleptomania** /ˌkleptəˈmeɪniə/ *noun*
شێتی دزی، دزەشێتی، نەخۆشی دزی (بنەڕەت: لە *kleptēs* یۆنانییەوە "دز "thief) ◌ جنون دزدی

**kleptomaniac** /ˌkleptəˈmeɪniæk/ *noun, adjective*
تووشبوو بە نەخۆشی دزی، دزەشێت، دوچاری شێتی دزی ◌ مبتلا به جنون دزدی

**kleptoparasite** *noun*
(گیانەوەرناسی، باڵندە، مێروو یان گیانەوەرێ) بەشەخۆر، بەشەفڕێن، بەشەڕفێن، بەشەدز (kleptoparasitism *n*؛ kleptoparasitic *adj*: بەشەخۆری، بەشەفڕێنی، بەشەڕفێنی، بەشەدزی) ◌ کلپتوپاراسیت

**klezmer** /ˈklɛzmə/ *noun, pl.* klezmorim /-rɪm/
1 موسیقای نەریتی جوولەکەی ڕۆژهەلاتی

ئەوروپا 2 موسیقازەنی ئەو موسیقایە (بنەڕەت: لـە *kĕlē zemer* عیـبری "ساز و ئـامێری موسیقایی") ◌ کلزمر

**klick** *noun*
(نافەرمی) کیلۆمیتر ◌ کیلومتر

**klieg light** /kli:g/ *noun*, also Klieg light
گلۆپ یا چرای فیلمهەڵگری (کارەبایی و تیژ؛ بنەڕەت: لە ناوی برایانی ئەمریکایی .Anton T *Kliegl* و .John H *Kliegl* کە ئەمەیان داهێنا) ◌ کلیگ لایت

**Klinefelter's syndrome** /ˈklʌɪnˌfɛltəz/ *noun*
کۆنیشانەی کلاینفێلتیر: لە پیاواندا کە دوو کرۆمۆزۆمی X یان هەیە کە بە قیافەیێکی باریک و درێژ، پیاوەتی کەم یان چکۆلەیی باتوو، تووکی دەموچاو دەسنیشان دەکرێن (بنەڕەت: لە ناوی پزشکی ئەمریکایی Harry *F. Klinefelter*) ◌ نشانگان کلاینفلتر

**klipspringer** /ˈklɪpˌsprɪŋə/ *noun*
بەردەبازە (جۆرێ ئاسک [ *Oreotragus oreotragus*]) ◌ نوعی آهو

**Klondike** /ˈklɒndʌɪk/ *noun*
سەرچاوەی کەرەسەی بەنرخ، خەزێنە، کلۆندایک، کلۆندیک (بنەڕەت: لە *Klondike* ـەوە لە یوکۆن Yukon ی کانادا، شوێنێ کە لە 1896 زێڕی لێدۆزرایەوە) ◌ کلوندیک

**klong** /klɒŋ/ *noun*
(لە تایلەند) ئاوەڕێ، ئاوەڕۆ، ڕەهەند، ئاودڕ، نۆکەند، کەنداو ◌ کانال

**kloof** /klu:f/ *noun*
(ئەفریکای باشووری) دۆڵی دارستانی ◌ کلوف

**klutz** /klʌts/ *noun*
مرۆی دەستەوسان و گەوج (*klutzy adj*) ◌ آدم دستوپاچلفتی و احمق

**klystron** /ˈklʌɪstrɒn/ *noun*
کلایسترۆن، کلیسترۆن: لوولەیێکی ئێکلیترۆنی کە وردەشەپۆل بە هۆی مۆدیولاسیۆنی خێراییەوە بەرهەم دێنێ یا زیاد دەکا، لوولەیێکی ئێلیکترۆنی کە لەودا دەستە ئێلیکترۆنی بە هۆی مەیدانی کارەباوە پێکدێ ◌ کلیسترون

**km** *abbreviation* kilometer(s)

**k-meson** = kaon. from K (for kaon) + meson

**kn** *abbreviation* knot
گرێی دەریایی (1853 میتر) ◌ میل یا گره دریایی

**knack** /næk/ *noun*
1 بار، ڕێگا، فێڵ، سوێ 2 شارەزایی، لێهاتوویی، توانایی، بەهرە، زیرەکی، هونەر، سەلیقە ◌ 1 قلق 2 مهارت، لیاقت، سلیقه

**knacker** /ˈnækə(r)/ *noun*
کۆنەکڕ، کەلاککڕ ◌ ناکر

**knackered** /ˈnækəd, US -kərd/ *adjective*
1 ماندوو، لەپێکەوتوو، exhausted، worn
2 *I was knackered after the game* :out
یەکجار کۆن (بەدەر لە بەکارهێنان)، شڕ، کەلاک: *The car's knackered* ◌ 1 خسته 2 فکسنی، ابوطیاره

**knacker's yard** *noun*
قەسابخانەی ئەسپ ◌ کشتارگاه اسب

**knackery** /ˈnækərɪ/ *noun*
قەسابخانە یان کوشتارگای ئەسپ ◌ کشتارگاه اسب

**knackwurst** /ˈnakwəːst/ *noun*, also knockwurst
ناکوۆرست: سۆسیسێکی ئەڵمانی پڕ seasoned چەور و کورت ◌ نوعی سوسیس

**knag** /nag/ *noun*
1 وشکەڵ 2 گرێ، کروێ، بەند، گرچک، قۆرت (بنەڕەت: لە *knagge* ئەڵمانی باکووری یان خواروو) ◌ 1 شاخەی خشکیده 2 گره

**knaggy** /ˈnagɪ/ *adjective*
گرێگرێ، کروێکروێ، قۆرتقۆرت ◌ دارای گره

**knap** /nap/ *noun*
1 (کۆن) سەرگرد، سەرتەپ، یاڵ، دیرەگ، پۆپە، نووچکە 2 گرد، تەپی چکۆلە، زورگ (*cnæpp* ئینگلیسی کۆن) *cnæp* ◌ 1 سر تپه 2 پشته

**knapper** /ˈnapə(r)/ *noun*
1 پیاکێشەر، پیادەر 2 چەکوش یان کوتکی بەردشکێن ◌ 1 زننده 2 ناپر

**knapsack** /ˈnæpsæk/ *noun*
کۆڵ، کۆڵەبار، پشتەوارە، توێشوودان، تێلەکە (*knapsacked adj*) ◌ کولەپشتی

**knapweed** *noun*
بەمـلە، گیاسەرخرە: سەرەگوڵەکانی کەرتەشیئاسای ئەرخەوانین [ *Centaurea nigra* و جۆرە پێوەندیدارەکان] ◌ قنطوریون

**knar** /nɑ:/ *noun*
(کۆن) گرێ، کروێ، گرچک، قۆرت ◌ گره

**knarred** *adjective*
گرێگرێ، گرێبەند، کروێکروێ، قۆرتقۆرت ◌ دارای گره

**knave** /neɪv/ *noun*
1 (یاری پەڕێن) سەرباز، خولام 2 مرۆڤی ناڕاست و بێئابڕوو، ناپیاو، نامەرد، بنیادەمی دەغەڵ، مرۆڤی نزم و خوێڕی، خوێڕیە پیاو ◌ 1 (بازی ورق) سرباز 2 آدم فرومایه و بیشرف

**knavery** /ˈneɪvərɪ/ *noun*, *pl.* knaveries
دەغەڵی، ناسەڕاستی، ناپاکی، ناپیاوی، بێئابڕوویی، بێشەرەفی، نزمی، نادروستی، خوێڕیەتی، سووکی ◌ تقلب، بیشرفی، فرومایگی

**knavish** /ˈneɪvɪʃ/ *adjective*

تیایە ۞ لپیدولیت

**Lepidoptera** /ˌlɛpɪˈdɒpt(ə)rə/ *noun, pl.*
پوولـەکەباڵان: وەکوو پەپوولـەکـان (شـەوگـەڕ moth یـان ڕۆژگـەڕ butterfly؛ بنـەڕەت: لـە *lepis, lepid-* "پوولـەکـە" + *pteron* "باڵ") ۞ لپیدوپترا

**lepidopteran** /ˌlɛpɪˈdɒpt(ə)rə/ *noun, adjective*
*n* پوولـەکەباڵان *adj* سـەربە پوولـەکەباڵان ۞ لپیدوپتران

**lepidopteron** /ˌlɛpɪˈdɒpt(ə)rə/ *noun*
مێرووی پوولەکەباڵ ۞ لپیدوپترون

**lepidopterous** *adjective*
پوولەکەباڵ ۞ لپیدوپتروس

**leporine** /ˈlɛpərʌɪn/ *adjective*
کەروێشکی، کەروێشکئاسا ۞ خرگوشی

**leprechaun** /ˈlɛprəkɔːn/ *noun*
(لە فۆلکلۆری ئیرلەندی‌دا) جنۆکەی گرگن ۞ جن کوتوله

**lepromatous** /lɛˈprəʊmətəs/ *adjective*
سـەربە دوو جۆری سەرەکی زۆر ئاستەمی گولی ۞ لپروماتوس

**leprosarium** /ˌlɛprəˈsɛːrɪəm/ *noun*
نەخۆشخانەی گولەکان ۞ بیمارستان جذامی‌ها

**leprosy** /ˈleprəsi/ *noun*
گولی، پیس، نالە، کەرەگوشـە، ریژ ۞ جذام

**leprous** /ˈleprəs/ *adjective*
1 گول، پێوەندی بە گولی‌یەوە هەیە، شێوەی گـولی دەدا 2 = scaly، scurfy ( leprously *adv*) ۞ جذامی، وابسته به جذام، شبیه به جذام

**lepta** = plural form of lepton1

**leptin** *noun*
(زینـدەکیمیا) لیپتین، تـەنکینـە، ناسکینە (جـۆری پرۆتئین کە لە لایەن شانەی چەورەوە بەرهەم دێ و بـاوەڕ وایـە کـە پاشـەکـەوتی چـەوری لـە لەشدا میزان دەکا، لە *leptos* یونانی‌یەوە "thin" + -in) ۞ لپتین

**lepto-** *prefix*
پێشگر: چکۆلە، پچوک، باریک، تەنک، تەسک: *leptocephalic* (بنەڕەت: لە *leptos* یونانی‌یەوە) ۞ پیشوند: کوچک، باریک

**leptocephalic** /ˌlɛptə(ʊ)sɪˈfalɪk, -kɛˈfalɪk-/ *adjective,* also leptocephalous /-ˈsɛf(ə)ləs, -ˈkɛf-/
سـەرباریک narrow-skulled ۞ دارای سر باریک

**lepton**[1] /ˈlɛptɒn/ *noun, pl.* lepta
لیپتۆن (یەکـەی پـارەی یونـان، بـایی سـەدیەکی دراخما) ۞ لپتون

**lepton**[2] /ˈlɛptɒn/ *noun, pl.* leptons
(فیزیـک) لیپتـۆن (بنـەڕەت: لـە *leptos* یونـانی "small" + -on) ۞ لپتون

**leptonic** *adjective*
(فیزیک) لیپتونیک، لیپتۆنی ۞ لپتونیک

**lepton number** *noun*
(فیزیک) ژمارەی لیپتۆن ۞ عدد لپتون

**leptospiral** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە leptospire ـەوە هەیە ۞ وابسته به لپتواسپیر

**leptospire** *noun*
هەریەک لە پێچەمووە spirochaete باریک و هەواژی‌یەکان aerobic لە توخم یان دەستەی *Leptospira* ئازادژی یا مشەخۆرن parasitic (لە شیردەراندا mammals) ۞ لپتواسپیر

**leptospirosis** /ˌlɛptə(ʊ)spʌɪˈrəʊsɪs/ *noun, pl.* leptospiroses
نـەخۆشی مشک، لیپتۆسپیرۆسیس (ئـازارێکی بـەکتریایی کرتێنـەران، سـەگ و گـوانداران کـە رادەگوێزرێ بۆ مرۆڤ) ۞ لپتوسپیروسیس

**leptotene** /ˈlɛptə(ʊ)tiːn/ *noun*
(زیندەناسی) باریکەتەنکینە: یەکەمین قۆناخی پرۆفـازی prophase کـەمـەدابەشبـوونی meiosis، بەدرێژایی ئەمە هەر کرۆمۆزۆمێ بە شێوەی تاڵ یان دەزووی باریک دەردەکەوێ ۞ لپتوتین

**Lesbian** *adjective*
سـەربە دوورگەی یونانی Lesbos ۞ وابسته به لسبوس

**lesbian** /ˈlezbiən/ *noun, adjective*
*n* پانپانۆکێ‌باز، ژنی پانپانۆکێ‌کردوو یـان هاوڕەگـەزباز *adj* 1 پانپانۆکێ‌کـردوو، هاوڕەگەزباز 2 سەربە ژنانی هاوڕەگەزباز ۞ *n* زن هم‌جنس‌باز *adj* 1 هم‌جنس‌باز 2 وابسته به زنان هم‌جنس‌باز

**lesbianism** *noun*
پانپانۆکێ(بـازی)، قوزەتەقێنـە، قـاش، هاوڕەگەزبازی ژنان ۞ هم‌جنس‌بازی زنان

**lese-majesté** *noun,* also lese-majesty /ˌliːz ˈmædʒɒsti, US ˌleɪz/
1 (فەرەنسی) پیلان بەدژی حکومەت، تاوان و خراپەکاری بەدژی حکومەت، وڵاتفرۆشی 2 بێ‌حورمەتی، بێ‌ڕێزی، ڕووداری (بنەڕەت: لە *lèse-majesté* فـەرەنسـی، ئـەویش لـە *laesa majestas* لاتینـەوە "دەسـەڵاتداری بـریندار") ۞ 1 توطئه علیه دولت 2 بی‌احترامی

**lesion** /ˈliːʒn/ *noun*
1 برین، زام، نزد، injury، harm: *skin/brain lesions* 2 دەرد، ئێش، ئازار، بەڵا ( lesioned *adj*) ۞ 1 زخم 2 آسیب، گزند، ضایعه

**less** /les/ *adjective, adverb, preposition*
کـەمتـر، چکۆلـەتر، وردتـر، minus: *less butter/time/importance* ◊ *less expensive/likely/intelligent* ◊ *Send a*

*cheque for the catalogue price, less 10% discount* ◌ کەمتر، کوچکتر

**-less** *suffix*

پاشگر: بێ ـ ـنەبوو: *flavourless* (بنەڕەت: لە - *lēas* ئینگلیسی کۆن، لە *lēas* "بێبەری لە، بێبەش لە"، -lessly و -lessness) ◌ پسوند: بیـ بدون

**lessee** /le'si:/ *noun*

کرێنشین، بەکرێگرتوو، کرێچی ◌ مستأجر

**lesseeship** *noun*

کرێنشینی، بەکرێگرتوویی، کرێچیتی ◌ مستأجری

**lesser** /'lesə(r)/ *adjective*

کەمتر، چکۆلەتر، بچووکتر ◌ کمتر، کوچکتر

**Lesser Bear** *noun*

(ئەستێرەوانی) ورچی بچووک، ورچۆلە، ک ◌ دب اصغر

**lesser burdock** *noun*

(ڕووەکناسی) حەشەگیرە [*Xanthium strumarium*] ◌ زردینە

**lesser celandine** *noun*

جۆرێ گیای چەندساڵەی گوڵزەردی ئوراسیایی لە خێزانی buttercup، خۆماڵی باکووری ئەمریکایە [*Ranunculus ficaria*] ◌ زردینە

**lesser cornstalk borer** *noun*

جۆرێ پەپوولەی شەوگەڕی pyralid، کرمۆکەکانی سەوزباوی باریکن کە ڕەهۆڵە بۆ نێو لاسک و قەد ب.ت. هی Indian corn (تزیک بە ناستی عەرز) لێیدەدەن [*Elasmopalpus lignosellus*] ◌ نوعی پروانە

**Lesser Dog** *noun*

(ئەستێرەوانی) سەگی بچووک، سەگۆلە ◌ کلب اصغر

**lesser honeywort** *noun*

(ڕووەکناسی) پلاوسەدری، گیابرنجە، گیابلاو، گیابرنج، گیابرنجی [*Serinthe monor*] ◌ علی

**lesser panda** = red panda

**lesser peach tree borer** *noun*

(جۆرێ) پەپوولەی شەوگەڕی باڵتەنگ clearwing moth، کرمۆکەکانی ڕەهۆڵ بۆ نێو داری درەختە دەنکدارەکان (ب.ت. داری کۆخ) لێیدەدەن [*Synanthedon pictipes*] ◌ نوعی پروانە

**lesson** /'lesn/ *noun*

1 وانە، دەرس: *She gives piano lessons* 2 ماوەی وانەخوێندن، سەعاتی وانە یان دەرس 3 چام، وانە، دەرس، نموونە 4 بڕگەیێ لە کتێبی پیرۆز کە بە درێژایی ئاهەنگێکی ئایینی دەخوێنرێتەوە، برگە، پاژ، بەش ◌ 1 درس 2 ساعت درس 3 درس عبرت 4 لسن، پارە

**lessor** /le'sɔ:(r)/ *noun*

بەکرێدەر ◌ موجر

**lest** /lest/ *conjunction*

نەکا، مەبادا، دووربێ، نەوەکوو ◌ نکند نە، مبادا

**let**[1] /let/ *noun*

1 بەکرێدان: *a long-term/short-term let* 2 ماڵی بەکرێ 3 کرێنشین، کرێچی ◌ 1 اجارە 2 منزل اجارەای 3 مستأجر

**let**[2] /let/ = past and past participle of let

**let**[3] /let/ *noun*

(تێنیس) لێت ◌ لت

**-let** *suffix*

پاشگر: بچووک، چکۆلە، چە، ژە، ـئۆلکە، ـئۆچکە، ـوولە، ـئۆکە، ـئۆلە، ـەڵە، ـلە، یلە، ـئۆک، ـچک: *booklet* ◌ پسوند: کوچک، چە

**let-down** *noun*, also letdown

ناهومێدی، دڵساری، بێهیوایی، disappointment ◌ یأس

**lethal** /'li:θl/ *adjective*

1 کوشندە، قڕکەر، تیابەر، مەرگاوی، مەرگبار: *a lethal weapon* ◊ *a lethal dose of poison* ◊ *The snake's venom is rarely lethal to humans* ◊ *death by lethal injection* 2 زیاناوی، زیانبار، harmful، devastating، destructive: *a lethal attack on his reputation* ◊ *The closure of the factory dealt a lethal blow to the town* ◌ 1 مهلک، مرگبار 2 مضر، زیانبار

**lethal gene** *noun*, also lethal factor, lethal mutant, lethal mutation

(زیندەناسی) ژێن یا بوهێلی کوشندە ◌ ژن مهلک

**lethally** /'li:θəli/ *adverb*

بە شێوەیەکی کوشندە، بە شێوەیەکی مەرگبار، کوشندانە، مەرگێنەرانە ◌ بە طور مهلک

**lethargic** /lə'θɑ:dʒɪk, US -'θɑ:rdʒ-/ *adjective*

1 سست، وەڕەز، خاو، داهێزراو، داوەشاو، گیانبەخاوکەوتوو، قورس، داگیراو، خەواڵوو، بێتاقەت، تەوەزەل، تەپ، تەمەڵ، لەشگران: sluggish 2 داوەشێنەر، داهێزرێنەر 3 نارەحەتکەر، دڵتەنگکەر ◌ 1 خمودە، بیحال 2 رخوتآور 3 افسردەکنندە

**lethargically** /lə'θɑ:dʒɪkli, US -'θɑ:rdʒ-/ *adverb*

داوەشێنەرانە، بە شێوەیەکی داهێزرێنەر ◌ بە طور رخوتآور

**lethargy** /'leθədʒi, US 'leθərdʒi/ *noun*

1 وەڕەزی، سستی، داهێزران، بێتاقەتی، خەواڵوویی، داوەشان، داوەشاوی، گیانبەخاوکەوتوویی، قورسی، داگیراوی، ناهۆگری، ناتامەزرۆیی، بێسەرنجی، بێهیوایی 2 (پزشکی) خەوەمەرگێنە ◌ 1 خمودی،

**lettering** /ˈletərɪŋ/ *noun*
1 پیتەکان، تیپەکان: 2 *Gothic -ring* (هونەری) کێشانەوە یان نووسینی پیتەکان (یان وشەکان) ◯ 1 حروف 2 (فن) طراحی حروف (یا کلمات)
**letter-lock** /ˈletə lɒk/ *noun*
قوفڵی پیتی ◯ قفل حروفی
**letter of credit** *noun*
(دارایی) باوەڕنامە، نامەی باوەڕی یا کرێدیت یا بانکی ◯ اعتبار اسنادی
**letter of intent** *noun*
بڕیارنامە ◯ قول‌نامە
**letter of understanding** *noun*
لێک‌گەیشتن‌نامە، نامەی لێک‌گەیشتن ◯ تفاهم‌نامە
**letter opener** = paper knife
**letter-paper** *noun*
کاغەزی نامەنووسی ◯ کاغذ نامەنویسی
**letter-perfect** *adjective*, also word-perfect
بێ‌کەم‌وکورتی، تەواودروست ◯ کاملاً صحیح
**letterpress** /ˈletə pres/ *noun*
1 دەق، نووسراوە (چاپ‌کراو ب.ت. کتێبی وێنەدار) 2 شێوازی چاپ‌کردن بە پیتە بەرجەستەکان 3 چاپی بە پیت (یان پیتی) ◯ 1 متن 2 روش چاپ با حروف برجسته 3 چاپ حروفی
**letting** /ˈletɪŋ/ *noun*
خانوو یان ئاپارتمانی بەکرێ، ماڵ یان دەستەخانووی بەکرێ: *holiday lettings* ◯ منزل یا آپارتمان اجاره‌ای
**Lettish** *adjective, noun*
*adj* سەربە لاتفیاییەکان یان زمانەکەیان، لاتفیایی *n* - 2 Latvian ◯ *adj* وابسته به لاتویایی‌ها یا زبانشان
**lettuce** /ˈletɪs/ *noun*
1 (رووەک‌ناسی) کاهوو، خاس، مارول [*Lactuca sativa*] 2 بۆ ناوی رووەک و گیای تر کە گەڵاسەوزەکانی دەخورێن، بەکاردێنرێ، ب.ن. lamb's lettuce ◯ کاهو
**let-up** /ˈlet ʌp/ *noun*
1 کەم‌بوونەوە، دابەزین، هاتنەخوارەوە، نیشتنەوە، سووک‌بوون، داشکان 2 هەڵوەستە، بچڕان، پسان ◯ 1 کاهش، ایست 2 انقطاع
**Letzeburgesch** /ˌlɛts(ə)bəːˈgɛʃ, US ˈlɛts(ə)ˌbəːgɪʃ/ (also Letzebuergesch) = Luxemburgish
**leu** /ˈleɪuː/ *noun, pl.* lei /leɪ/
لیۆ: یەکەی بنچینەی پارەی رۆمانیا، بەرامبەر بە سەد ban ◯ لیو
**leucine** /ˈluːsiːn/ *noun, abbreviation* Leu, Symb. L
(زیندەکیمیا) لوسین، سپینە: ترشەڵۆکێکی ئەمینۆی بنەڕەتی $C_6H_{13}NO_2$، لە زۆربەی

رخوت، بی‌علاقگی 2 لتارجی، سبات
**lethe** /ˈliːθi/ *noun*, Latin, from Greek *Lēthē*, from *lēthē* forgetfulness
1 (Lethe) لە میتۆلۆژی یۆنانی‌دا) رووباری لەبیرچوونەوە 2 لەبیرچوونەوە، بیرچوونەوە، فەرامۆشی ◯ 1 لته 2 فراموشی
**Lethean** /ˈliːθiən/ *adjective*
1 سەربە رووباری لەبیرچوونەوە (لە میتۆلۆژی یۆنانی‌دا، ئەو رووبارەی دنیای مردووان کە هەرکە لەی بخورایەتەوە، مردووان ژیانی خۆیان لەسەر دنیا لەبیر دەبردەوە) 2 مایەی فەرامۆشی یان لەبیرچوونەوە، لەبیربەرەوە، فەرامۆشی‌هێنەر ◯ 1 لتیان 2 موجب فراموشی، فراموشی‌آور
**lethiferous** /lɪθɪfərəs/ *adjective*
مەرگاوی، کوشندە، قڕکەر، مەرگێنەر ◯ مرگبار
**Letraset** *noun*
لێتراسێت (کۆمەڵە پیتێکی چاپی پێکەوەنووساو) ◯ لتراست
**let's** = let us
با، بلا، وەرن، بێلە، بێڵن ◯ بیایید، بگذارید
**Lett** = Latvian
**letter** /ˈletə(r)/ *noun*
1 نامە، کاغەز 2 (ئەلفوبێ) پیت، تیپ 3 بەڵگە، نووسراوە، تێبینی 4 دەق 5 گوتە، وتە، بێژە 6 (چاپ) شێوازی فۆنت یان دەستەتیپ 7 (letters) وێژە، توێژە 8 (کۆن) زانیاری، زانست، زانایی، زانیاری (ئینگلیسی نێوەڕاست، لە *lettre* فەرەنسی کۆن، لە *littera* ،*litera* لاتین "پیتی ئاوبی"، (کۆ) "culture ،literature ،epistle")
◯ 1 نامه 2 حرف 3 سند، نوشته 4 نص 5 لفظ 6 سبک قلم 7 (در جمع) ادبیات 8 علم، دانش
**letter bomb** *noun*
بۆمبی نامەیی، بۆمبی پۆستی ◯ بمب پستی
**letter-box** /ˈletəbɒks, US -tərb-/ *noun*
سنووقی نامە، سنووقی پۆست ◯ صندوق پست
**letter-carrier** *noun*
نامەبەر ◯ پستچی
**letter-case** *noun*
کیفی نامە، نامەدان، جێ‌نامە ◯ کیف نامه
**letter-drop** *noun*
(کونی) سنووقی پۆست ◯ (دهانەی) صندوق پست
**lettered** *adjective*
خوێندەوار، خوێندە، میرزا، سەواددار، رۆشنبیر، رووناکبیر، educated ،learned ◯ تحصیل‌کرده، باسواد، اندیشمند
**letterhead** /ˈletəhed, US -tərh-/ *noun*
1 سەرپەڕ، سەرنامە، کاغەزی نیشانەدار، سەرکاغەز 2 تایبەتمەندی (تێو و نیشان) چاپ‌کراو لە سەرووی سەرپەڕ ◯ 1 سربرگ 2 مشخصات چاپ‌شده بالای سربرگ

گیانی ژن (بەهۆی سووربوونەوە (یان خوێن‌تێزان congestion) و هەوکردنی پەردەی کیمی mucous membrane) ◯ لوکوریا

**leucorrhoeal** *adjective*, US leucorrheal, leukorrheal
سەربە لیمانەرژێ ◯ وابستە بە لوکوریا

**leucosis** /lu:'kəʊsɪs/ *noun*, also leukaemia
نەخۆشی شێرپەنجەی خوێنی گیانەوەران ◯ لوکوز، لوکوسیس

**leucotic** *adjective*
سەربە لیۆکوز یان لیۆکوسیس ◯ وابستە بە لوکوز، لوکوسیس

**leucotomy** /lu:'kɒtəmi/ = lobotomy

**leukaemia** /lu:'ki:miə/ *noun*, US leukemia
شێرپەنجەی خوێن، لووکیمیا ◯ لوسمی

**leukaemic** *adjective*
سەربە شێرپەنجەی خوێن، لووکیمیایی ◯ وابستە بە لوسمی

**leukaemogenesis** *noun*
پێکهاتنی شێرپەنجەی خوێن یان لووکیمیا ◯ لیوکیموژنیز

**leukaemogenic** /lu:ˌki:mə(ʊ)'dʒɛnɪk/ *adjective*, US leukemogenic
پێوەندی بە پەرەسەندنی شێرپەنجەی خوێنەوە هەیە ◯ لیوکیموژنیک

**leukocyte** = leucocyte

**leukopoiesis** *noun*
سازبوون یان پێکهاتنی خڕۆکەی سپی ◯ تکون گلبول سفید

**leukopoietic** *adjective*
سەربە leukopoiesis ◯ وابستە بە تکون گلبول سفید

**leukotriene** /ˌlu:kə(ʊ)'trʌɪi:n/ *noun*
(زیندەکیمیا) کۆمەڵێ لە ئاوێتە چالاکەکان active compounds لە باری زیندە(وەر)ناسییەوە biologically، لە لەش‌دا و بەهۆی arachidonic acid پێکدێن، کۆمەڵێکی ئایکۆسانۆئیدەکان eicosanoid کە لە کاردانەوە allergicەکان‌دا بەشدار دەکەن ◯ (لـ...)وکوترین

**Lev.** *abbreviation* Leviticus (in biblical references)

**lev** /lɛv, US lɛf/ *noun*, also leva /'lɛvə/, *pl.* leva or levas or levs
یەکەی بنەرەتی پارەی بولگاریا، بەرامبەر بە سەد stotinka ◯ لو

**Levalloisian** *adjective*
(زەویناسی) سەربە فەرهەنگ یان چاندی Palaeolithic ی نێوەراست و شوێنەوارەکانی ئەو سەردەمە کە دۆزینەوەی ئاور بووە (بنەرەت: *Levallois*-Perret دەوروپشتی پاریسی فەرەنسە) ◯ لوالوایسیون

پرۆتینەکان‌دا هەیە ◯ لیوسین

**leucistic** /lu:'sɪstɪk/ *adjective*
(گیانەوەرناسی) خاوەنی تووک، پەڕوباڵ یان کەوڵی سپی، لەبەر نەبوونی pigment ◯ لیوسیستیک

**leucite** *noun*
لیۆسیت: جۆرێ کانی سپی یان بۆر، لە سیلیکاتی پۆتاسیۆم یان ئالۆمینیۆم پێکهاتووە و لە بەردە ئاگرینەکان‌دا هەیە ◯ لیوسیت

**leucitic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە leucite ـەوە هەیە ◯ وابستە بە لیوسیت

**leuco-** (also leuko-) *prefix*
پێشگر: 1 سپی، چەرموو 2 خڕۆکەی سپی: (بنەرەت: لە *leukos* یۆنانییەوە ("white" ◯ پیشوند: 1 سفید 2 گلبول سفید

**leucocidin** *noun*
ماک یان سابستەنسێکی بەکتریایی کە خڕۆکە سپییەکانی خوێن لەنێو دەبا یان دەفەتێنێ ◯ لوکوسیدین

**leucocyte** /'lu:kəsaɪt, US -kəʊs-/ *noun*, also leukocyte
(کارئەندامناسی) خڕۆکەی سپی ◯ گلبول سفید

**leucocytic** *adjective*
سەربە خڕۆکەی سپی ◯ وابستە بە گلبول سفید

**leucocytosis** /ˌlu:kə(ʊ)sʌɪ'təʊsɪs/ *noun*, leukocytosis
زۆربوونی ژمارەی خڕۆکە سپییەکان لە خوێن‌دا، ب.ت. بەدرێژایی نەخۆشی ◯ لیوکوسیتوز، لیوکوسیتوسیس

**leucocytotic** *adjective*
سەربە لوکوسیتۆسیس ◯ وابستە بە لیوکوسیتوز

**leucoderma** /ˌlu:kə(ʊ)'də:mə/ = vitiligo

**leucoma** /lu:'kəʊmə/ *noun*
خەستی کۆرنیە، چری کۆرنیە (بنەرەت: لە *leukōma* یۆنانی) ◯ غلظت قرنیه

**leucopenia** /ˌlu:kə(ʊ)'pi:nɪə/ *noun*, also leukopenia
کەم‌بوونەوەی ژمارەی خڕۆکە سپییەکانی خوێن ◯ لوکوپنیا

**leucopenic** *adjective*
سەربە یان پێوەندی بە لوکوپێنیاوە هەیە ◯ وابستە بە لوکوپنیا

**leucoplast** /'lu:kə(ʊ)plast, US -plɑ:st/ *noun*
(رووەکناسی) ئەندامۆکەی بێ‌ڕەنگی نێو خانەکانی رووەک، بۆ هەڵگرتنی نشاستە یان رۆن بەکاردێتێ ◯ لوکوپلاست

**leucorrhoea** /ˌlu:kə'ri:ə/ *noun*, US leucorrhea, leukorrhea
لیمانەرژێ: لێهاتنی کیمی سپی‌باو یان رەش‌باو لە

**Levant** /lɪ'vænt/ *noun*, geographical name
(کۆن) رۆژهەلات، خۆرهەلات (هی مەدیتەرانە) ◌ خاور، مشرق

**levanter** *noun*
رۆژهەلاتی، خەلکی (لای) رۆژهەلات ◌ اهل مشرق

**Levantine** /'levəntaɪn/ *adjective, noun*
*adj* رۆژهەلاتی، خۆرهەلاتی، سەربە رۆژهەلات *n* 1 خەلکی (لای) رۆژهەلات 2 پارچەی هاوریشمی یان ئاوریشمی ◌ *adj* شرقی *n* 1 اهل مشرق 2 پارچەی حریری

**levator** /lɪ'veɪtə/ *noun*
(تویکاری) ماسوولکەی بەرزکەرە یان هەلینەر ◌ عضلەی رافعە

**levee**[1] /'levi/ *noun*
میوانداری شایانە ◌ پذیرایی ملوکانە

**levee**[2] /'levi/ *noun*
1 سرک، لافاوگیرەوە، دیواری سیلاو، لافاوبەند، بەربەست، بەربەند،کەرپە 2 لەنگەرگا، = quay ◌ 1 لوار 2 اسکلە

**level** /'levl/ *adjectivem noun*
*adj* 1 ریک، تەخت، راست، دۆخ، گۆر، هاوئاست، بێ‌لێژایی، تەراز، ریک، مال؟: 2 *low/high pollution levels* بەقەدیەک، یەکسان، بەرامبەر، یەک‌ئەندازە، یەک‌دەست *n* ئاست، روو، تەخت، ریک، هیلی ئاسویی، هیلی پۆیی، ئاستی پۆیی ◌ *adj* 1 صاف، هموار 2 هم‌سطح، مساوی *n* سطح، خط افقی، سطح افقی

**level crossing** *noun*
یەکتربرینی هاوئاست یا تەراز ◌ تقاطع هم‌سطح

**leveler** = leveller

**level-headed** *adjective*
ژیرانە، لۆژیکی، ئاقلانە، لەسەرەخۆ ◌ منطقی، معقول

**leveller** /'levələ(r)/ *noun*, US leveler
1 یەکسان‌خواز، لایەنگری بەرامبەری (سیاسی و کۆمەلایەتی) 2 (Leveller) ئەندامی کۆمەلی تونرەوی جودابیرانی شەری نیوخۆیی ئینگلتەرە (1642-9) 3 تەرازگر ◌ 1 مساوات‌طلب 2 و 3 لولر

**levelling** *noun*
ریکاندن، ریک‌کردن، تەختاندن، تەخت‌کردن، بیراز، بیرازتن، راستەوپاستەکردن ◌ تسطیح

**leveling-rod** /'levəlɪŋ rɒd/ *noun*
میلی ئەندازەی ئاستی یان ئاست‌پیو ◌ دستک مساحی

**levelness** /'levlnəs/ *noun*
ریکی، تەختی، گۆری، راستی، تەرازی ◌ همواری، صافی

**levelly** /'levəli/ *adverb*
بە شیوەیەکی ریک، تەختانە ◌ بە طور صاف

**lever** /'liːvə(r), US 'levər/ *noun*
1 نیل، نویل، شیروکول، لۆسە، بەرازە، باری، چل‌میردە، چلمیر (لە دار)، قەراسە، سمک، مەلغە، دەسک، کەرانە، میلە، لایز، لهازە، مانیلا، مالیلا، بەرزکەرە 2 (خوازە) کەرەسەی سەنگی‌دانان، ئامرازی گوشار خستنەسەر ◌ 1 اهرم، دیلم 2 وسیلەی اعمال فشار

**leverage** /'liːvərɪdʒ, US 'lev-/ *noun*
1 کار یان هیزی نویل، بەکارهینانی لۆسە 2 سوود و کەلکی میکانیکی نویل 3 (خوازە) هیز، دەسەلات، دەس‌رۆیشتوویی، کاریگەری، باندۆر ◌ 1 بە کارگیری یا قدرت اهرم 2 سود مکانیکی اهرم 3 (مجازی) نفوذ، قدرت، تأثیر

**leveret** /'levərət/ *noun*
خرنک، بەچکە کەرویشک، بیچووە کەرویشک ◌ بچەخرگوش

**leviathan** /lə'vaɪəθən/ *noun, adjective*
1 لیڤایسین، نەهەنگ، لیڤیاتان (کتیبی پیرۆز: گیانەوەریکی ئاوی) 2 کەشتی گەورە 3 (شتی) کەل، زەبەلاح، یەکجارگەورە و بەهیز، دیو: *the 4 -han of government bureaucracy* دەولەت یان پاتشای زۆردار و ئۆتۆکراتیک (ئاماژە بە *Leviathan* هابز (1651)؛ بنەرەت: لە *liwyāṯān* عیبری) ◌ 1 لوی‌یاتان 2 کشتی بزرگ 3 هیولا، بسیار بزرگ و قوی 4 لویاتان

**levigation** /levə'geɪʃn/ *noun*
مشت‌ومال‌دان، نەرم‌کردنەوە، ساوینەوە، هارین ◌ صیقل‌زنی، نرم‌سازی، سحق

**levin** /'levɪn/ *noun*
(کۆن) برووسکە، چەخماخە، تریشقە، هەرووەتریشقە، چرف، تەشبریق (رەنگە بنەرەتیکی سکاتلەندی هەبی) ◌ آذرخش، برق

**levirate** /'liːvɪrət, US 'lev-/ *noun*, usu. the levirate
نەریتی جووەکانی زوو و هیندی لە گەلانی تر کە دوای مەرگی براکەیان براژنەکەیان مارە کەنەوە ◌ لویرات

**Levis** /'liːvaɪz/ *noun*
شەلواری لی، لیڤایز ◌ شلوار لی

**levitation** /ˌlevɪ'teɪʃn/ *noun*
کەوتنەحەوا، سووک‌بوون، بەرزبوونەوە، فرین (ب.ت. بەهۆی هیزیکی سەروو سروشتی‌یەوە) ◌ پرواز

**Levite** /'liːvaɪt/ *noun*
1 لیڤایت، لاڤی، لاوی، لاوی‌زادە: کوری یەعقووبی پیغەمبەر 2 لیڤیت (ئەندامی خیلی جوولەکەی لیڤی Levi) ◌ 1 لاوی، زادەی لاوی 2 لویت

**Levitical** /lɪ'vɪtɪk(ə)l/ *adjective*
1 سەربە لیڤیت 2 سەربە کتیبی لاڤیتان ◌ وابستە بە لویت

**Leviticus** /lɪˈvɪtɪkəs/ *noun*
کتێب یان سیفری لاویان یان لافیتان ۞ کتاب یا سفر لاویان

**levity** /ˈlevəti/ *noun, pl.* levities
1 سەرچڵی، هەڵەشەیی، سەرەڕۆیی 2 سووکی، رەفتارسووکی، چڵفی، قسەرتی‌گەری 3 وازیوازیبوون، تاوتاوی، راڕایی ۞ 1 سبکسری 2 جلفی 3 دمدمی، تلون مزاج

**levonorgestrel** /ˌliːvəʊnɔːˈdʒestr(ə)l/ *noun*
شێوەیێکی levorotatory چەپسووڕانەی پرۆژێستین progestin یکێ پێکهێنراو یان سینتیتیک $C_{21}H_{28}O_2$ ۞ لوونورجسترل

**levorotation** *noun*
سووڕان بەرەو چەپ، چەپسووڕی، چەپڕەوی، چەپڕۆیی ۞ چرخش به چپ

**levorotatory** /ˌliːvəʊˈrəʊtət(ə)ri/ *adjective*, US levorotary
داشکاو بەرەو چەپ، چەپسووڕ، چەپڕەو، چەپڕۆ، بۆ لای چەپەوە دەسووڕێتەوە (بڕوانە dextrorotatory) ۞ دارای تمایل چرخش به چپ

**levulose** = laevulose

**levy** /ˈlevi/ *noun*
1 (باج) دانان، سەندن، داسەپاندن 2 باجی کۆوەکراو 3 (دانانی) باج 4 سەربازگیری، ڕەش‌بگیری، سەربازان ۞ 1 وضع، تحمیل 2 مالیات وصولی 3 مالیات(بندی) 4 احضار مشمولین، سربازان

**lewd** /luːd, US ljuːd/ *adjective*
بەئالۆش، هەوەساوی، زەنەک، بزوێنەر، شەهوانی، سێکسی، پیس، هەرزە (lewdly *adv*: بزوێنەرانە) ۞ شهوت‌ران، شهوت‌انگیز، زشت

**lewdness** /luːdnəs, US ljuːdnəs/ *noun*
1 بەئالۆشی، زەنەکی، ناحەزی، پیسی، هەرزەیی 2 بێ‌شەرمی، بێ‌حەیایی ۞ 1 شهوت‌رانی، زشتی 2 وقاحت

**lewis** *noun*
دەزگایێ بۆ هەڵێنانی تەختەبەرد یان کۆنکرێتی قورس ۞ لویس

**Lewis acid** *noun*
(کیمیا) ترشەڵۆکی لیویس (بنەڕەت: لە ناوی کیمیازانی ئەمریکایی *Lewis* .Gilbert N) ۞ اسید لویس

**Lewis base** *noun*
(کیمیا) تفتی لیویس ۞ باز لویس

**Lewis gun** /ˈluːɪs gʌn/ *noun*, also lewis gun
لیویس‌گان (جۆرێ شەستیر machine gun، بنەڕەت: لە ناوی کۆلۆنێلی ئەمریکایی Isaac .N *Lewis*) ۞ لویس گان

**Lewisian** /luːˈɪsɪən/ *adjective*
(زەویناسی) لیویسیەن (سەربە قۆناخی سەرەتای Proterozoic لە ڕۆژاوای باکووری سکاتلەند، کە کۆنترین بەردەکان لە بریتانیا نیشتن؛ بنەڕەت: لە ناوی دوورگەی *Lewis* لە Outer Hebrides (شوێنێ کە زۆربەی outcrop ـەکانی ئەو تەختەبەردانە لەوێ دۆزرانەوە) ۞ لویسیان

**lewisite** /ˈluːɪsʌɪt/ *noun*
ئاوێتەیێکی بێ‌بۆن و زەردی کاڵ $C_2H_2AsCl_3$، لە شەڕی جیهانی یەکەمدا وەک هۆکاری هەڵزلەێنەر vesicant بەکاردێنرا (بنەڕەت: لە ناوی کیمیازانی ئەمریکایی .Winford L *Lewis* 1043 مردووە) ۞ لوییسیت

**lex** *noun, pl.* leges
قانوون، زاکوون، یاسا، زاگۆن ۞ قانون

**lexeme** /ˈleksiːm/ *noun*
(زمانەوانی) لێکسیم، وشۆکەی فەرهەنگی، یەکەی وشەمەنی(یانە، لە lexicon + -eme پێکهاتووە) ۞ لکزم

**lexemic** *adjective*
(زمانەوانی) لێکسیمیک، سەربە وشۆکەی فەرهەنگی، سەربە یەکەی وشەمەنی(یانە) ۞ لکزمیک

**lexical** /ˈleksɪkl/ *adjective*
(زمانەوانی) سەربە وشەمەنی، فەرهەنگی، وشەمەنی‌یانە ۞ واژگانی

**lexical change** *noun*
(زمانەوانی) گۆڕانی وشەمەنی(یانە) ۞ تغییر واژگانی

**lexical classification** *noun*
(زمانەوانی) پۆلاندنی وشەمەنی(یانە) ۞ طبقه‌بندی واژگانی

**lexical difussion** *noun*
(زمانەوانی) بڵاوبوونەوەی وشەمەنی(یانە) ۞ انتشار واژگانی

**lexical entry** *noun*
(زمانەوانی) سەروشەی وشەمەنی(یانە) ۞ مدخل واژگانی

**lexically** /-kli/ *adverb*
بە شێوەیەکی وشەمەنی‌یانە ۞ به طور واژگانی

**lexical meaning** *noun*
(زمانەوانی) واتای وشەمەنی(یانە) ۞ معنای واژگانی

**lexical relation** *noun*
(زمانەوانی) پێوەندی وشەمەنی(یانە) ۞ رابطه‌ی واژگانی

**lexical structure** *noun*
(زمانەوانی) پێکهاتەی وشەمەنی(یانە) ۞ ساخت واژگانی

**lexical system** *noun*
(زمانەوانی) دەزگای وشەمەنی(یانە) ۞ دستگاه واژگانی

**lexical transference** *noun*
(زمانەوانی) راگوێستنی وشەمەنی(یانە) ۞ انتقال واژگانی

**lexical unit** *noun*
(زمانەوانی) یەکەی وشەمەنی(یانە) ۞ واحد واژگانی

**lexical verb** *noun*
(زمانەوانی) کاری وشەمەنی(یانە) ۞ فعل واژگانی

**lexical word** *noun*
(زمانەوانی) وشەی فەرهەنگی ۞ واژەی قاموسی

**lexicographer** /ˌleksɪˈkɒɡrəfə(r), US -ˈkɑːɡ-/ *noun*
فەرهەنگنووس، فەرهەنگدانەر ۞ فرهنگنویس

**lexicographical** /leksəkəʊˈɡræfɪkl/ *adjective*, also lexicographic
فەرهەنگنووسییانە، سەربە فەرهەنگنووسی ۞ وابستە بە فرهنگنویسی

**lexicography** /ˌleksɪˈkɒɡrəfi, US -ˈkɑːɡ-/ *noun*
فەرهەنگنووسی، لێکسیکۆگرافی، دانانی فەرهەنگ، بنەماکانی فەرهەنگنووسی، تیۆری فەرهەنگنووسی ۞ فرهنگنویسی

**lexicological** *adjective*
سەربە وشەناسی، پێوەندی بە وشەناسییەوە هەیە ۞ واژەشناختی

**lexicologically** *adverb*
لەباری وشەناسییانەوە ۞ از لحاظ واژەشناختی

**lexicologist** *noun*
وشەناس ۞ واژەشناس

**lexicology** /ˌleksɪˈkɒlədʒi, US -ˈkɑːl-/ *noun*
وشەناسی، زانستی وشە، زانستی وشەمەنی ۞ واژەشناسی

**lexicometry** *noun*
وشەپێوی ۞ واژەسنجی

**lexicon** /ˈleksɪkən, US -kɑːn/ *noun*
وشەمەنی (لە بەرامبەر ڕێزماندا)، فەرهەنگ (ب.ت. زمانێکی کۆن، ب.ت. یۆنانی و عیبری) ۞ واژگان، فرهنگ لغت

**lexigram** /ˈlɛksɪɡram/ *noun*
لێکسیگرام، وشەدەرخەر، وشەنوێن (هێمایێ کە وشەیێ دەرخاتەڕوو، ب.ت. ئەوەی بۆ فێربوونی زمانێ بەکاردێترێ) ۞ لکسیگرام

**lexis** /ˈleksɪs/ *noun*
وشەمەنی (هاوواتای vocabulary؛ بنەڕەت: لە یۆنانییەوە "وشە") ۞ واژگان

**lex talionis** /lɛks ˌtalɪˈəʊnɪs/ *noun*
قانوونی هەمان سزا یان هەر ئەو سزایە ۞ قانون کیفر عینی

**ley**[1] /leɪ/ *noun*
مێرگ، گیاجاڕ، سەوزەلان، چیمەنجاڕ، شینایی ۞ چمنزار

**ley**[2] /leɪ/ *noun*, also ley line
هێڵی بەستنەوەی جادوویی ۞ خط رابط جادویی

**Leyden jar** /ˈlʌɪd(ə)n/ *noun*
شووشەی لایدن (بنەڕەت: لە ناوی ***Leyden*** (یان ***Leiden***) شارێکی هولەندەوە کە لەوێ داهێنرا 1745) ۞ بطری لیدن

**ley farming** *noun*
وەرزاوەرز: چاندنی بەنۆرەی بەرووبوو ۞ لی فارمینگ

**Leyland cypress** /ˈleɪlənd/ *noun*
داری سەروی لەیلاند یان سەنەوبەری متوربەکراوی زووهەڵدەر [× *Cupressocyparis leylandii*] ۞ درخت سرو لیلاند

**leylandii** /leɪˈlandɪʌɪ/ = Leyland cypress, *pl.* same

**LF** *abbreviation* low frequency

**lh** *abbreviation* left hand

**LH** *abbreviation* 1 (Biochemistry) luteinizing hormone 2 left hand

**Lhasa apso** /ˈapsəʊ/ *noun, pl.* Lhasa apsos
جۆرێ ڕەگەزی سەگی چکۆلانەی تەبەتی ۞ نوعی سگ

**Lhasa apso** /ˈapsəʊ/ *noun, pl.* Lhasa apsos
جۆرێ ڕەگەزی سەگی چکۆلانەی تەبەتی ۞ نوعی سگ

**LHD** *abbreviation* left-hand drive

**Li** symb. the chemical element lithium

**li** /liː/ *noun. pl.* same
یەکەی پێوانی مەودای چینی، بەرامبەر بە 0.6 کیلۆمیتر (0.4 مایل) ۞ لی

**liability** /ˌlaɪəˈbɪləti/ *noun, pl.* liabilities
1 بەرپرسایەتی (قانوونی)، لێپرسراوێتی، دەربەستی: The company cannot accept liability for any damage caused by natural disasters 2 زۆرەملی، زۆرەکی 3 قەرز 4 ئامادەیی، بۆهەبوون 5 مایەی دەردەسەری، بەلا، ئۆباڵی گەردن ۞ 1 مسؤلیت 2 اجبار 3 بدهی 4 استعداد 5 وبال گردن

**liable** /ˈlaɪəbl/ *adjective*
1 بەرپرس (لەباری قانوونی)، لێپرسراو: *You will be liable for any damage caused* 2 بەرکەوتوو 3 لەبەر 4 ئامادە، بۆی هەیە، ڕێتێچوو، لەوە دەچێ، لەوەچوو ۞ 1 مسؤل 2 مشمول 3 در معرض 4 مستعد، محتمل

**liaison** /liˈeɪzn, US liˈeɪzɑːn, ˈliəzɑːn/ *noun*
1 پێوەندی (دوولایەنە)، پێوەستی، تێکەڵی: *We work in close liaison with the police* 2 تێکەڵی، پێوەندی سێکسی نهێنی 3 (دەنگناسی)

دەنگی نەبزوێنی کە لە کۆتایی وشەیێکدا بێدەنگە، چونکو وشەی دواتر بە پیتی بزوێن دەس پێدەکا ۞ 1 ارتباط 2 رابطەی جنسی پنهانی 2 لیزون

**liana** /lɪˈɑːnə/ *noun*, also liane /-ˈɑːn/, *pl.* liana
لیانا: جۆرێ گیای هەڵچووی ناوچە گەرمێنەکان ۞ لیانا

**liar** /ˈlaɪə(r)/ *noun*
درۆزن، فرەک: *Shelley wasn't a very good liar* ۞ دروغگو

**lias** /ˈlʌɪəs/ *noun*, also Lias
1 (هەروەها Lias) زەویناسی) سەرەتاترین قۆناخی سەردەمی ژوراسیک، دەوروبەری 208 تا 178 میلیۆن ساڵ لەوەپێش 2 (هەروەها blue lias) بەردەقسڵی گڵی بۆری شینی ئەو سەردەمە، زۆرتر لە باشووری ڕۆژاوای ئینگلتەرە دۆزراوەتەوە ۞ لیاس

**liassic** *adjective*, also Liassic
سەربە یان پێوەندی بە lias ـەوە هەیە ۞ وابستە به لیاس

**liatris** /lʌɪˈatrɪs/ *noun*, *pl.* same
(ڕووەکناسی) گیای تیرەیێ کە blazing star لە تیرەی daisy دەگرێتەوە [توخم *Liatris*] ۞ نوعی گیاه

**lib** /lɪb/ *abbreviation* liberation

**Lib** /lɪb/ *abbreviation* Liberal Party

**libation** /laɪˈbeɪʃn/ *noun*
1 مەیپرژێنی، پرژاندن یان ڕژاندنی مەی (بەسەر یان جەستەی قوربانی و پێشکەشکردنی بۆ خودایان) 2 (بە شۆخی) مەی، ئارەق، خواردنەوە ۞ 1 لیباسیون 2 مشروب

**Lib Dem** /ˌlɪb ˈdem/ *abbreviation* Liberal Democrat

**Lib Dems** *abbreviation* Liberal Democrats

**libeccio** *noun*, also libecchio
لیبێچو: بایێکی باشووری ڕۆژاوای ئیتالیا (بنەڕەت: لە *libeccio* ئیتالیاییەوە) ۞ لیبچو

**libel** /ˈlaɪbl/ *noun*
1 فر، فرنامە، سووکایەتی(نامە) 2 ئابڕووبردن، نیوزڕاندن، تۆمەت، هەڵبەستە، بوختان، شلتاخ، بوختاننامە 3 مایەی ئابڕووچوون، مایەی بێئابڕوویی، مایەی سەرشۆڕی ۞ 1 هجو، هجویه 2 توهین، افترا، تهمت، افترایه 3 مایەی آبروریزی

**libellous** /ˈlaɪbələs/ *adjective*
1 نیوزڕێن، تۆمەتاوی، بوختاناوی، ئابڕووبەرانە: *a libellous statement* 2 دەمپیس، جنێوفرۆش، دەمچەوت، دەمبەجنێو ۞ 1 افتراآمیز 2 فحاش

**liber** *noun*
(لە لێکدانا) لایەنگری ئازادی ۞ طرفدار آزادی

**liberal** /ˈlɪbərəl/ *adjective, noun*
1 *adj* ئازادبیر، لێبووردە، ئادەمارگرژ، بێلایەن، ڕزگاریخواز، ئازادیخواز، نەرمڕەو، لیبراڵ: *liberal* ◊ *liberal attitudes/views/opinions* ◊ *Some politicians want more democracy* 2 *liberal trade relations with Europe* ڕزگاریخوازانە، ئازادیخوازانە 3 ڕۆشنبیرانە، ڕووناکبیرانە 4 (وەرگێران) ئازاد: *a liberal translation of the text* 5 دەسودڵباز، بەدەهەندە 6 زۆر، فرە *n* (مرۆ) ئازادیخواز، لیبراڵ ۞ *adj* 1 آزاداندیش، آزادیخواه، متسامح، میانەرو 2 آزادیخواهانه 3 روشنفکرانه 4 (ترجمه) آزاد 5 سخی 6 وافر *n* (آدم) آزادیخواه

**Liberal** /ˈlɪbərəl/ *noun, adjective*
*n* ئەندام یان لایەنگری پارتی لیبراڵ *adj* سەربە پارتی لیبراڵ ۞ *n* عضو یا طرفدار حزب لیبرال *adj* وابسته به حزب لیبرال

**liberal arts** *noun, pl.*
زانستە مرۆڤییەکان ۞ علوم انسانی

**Liberal Democrat** *noun*
ئەندام یان لایەنگری دیموکراتە لیبراڵەکان ۞ عضو یا طرفدار دموکرات‌های لیبرال

**the Liberal Democrats** *noun, pl.*
دیموکراتە لیبراڵەکان (یەکێ لە پارتە سەرەکییەکانی بریتانیا، لایەنگری گۆڕانکاری سیاسی و کۆمەڵایەتی، بەڵام نە بە شێوەیەکی توندڕەوانە) ۞ دموکرات‌های لیبرال

**liberalism** /ˈlɪbərəlɪzəm/ *noun*
ڕزگاریخوازی، بیرکراوەیی، ئازادیخوازی (ب.ت. لە بواری سیاسەتدا) ۞ آزادیخواهی، آزادیبخشی

**liberalist** /ˈlɪbərəlɪst/ *noun*
ڕزگاریخواز، ئازادیخواز، بیرکراوە (liberalistic *adj*) ۞ آزادیخواه، آزادیبخش

**liberality** /ˌlɪbəˈræləti/ *noun*, *pl.* liberalities
1 ڕزگاری، ئازادی، سەربەستی، پشووفراوانی، گەورەیی، هەڵکردوویی، سنگفراوانی، لێبووردەیی، لانەگری، بیرئازادی 2 دەسکراوەیی، بەخشندەیی، دلاوایی، بەدەهەندەیی 3 دیاری یان پێشکەشی بەدەهەندانە ۞ 1 آزادگی، سعەی صدر، تسامح 2 سخاوت 3 هدیەی سخاوتمندانه

**liberalization** /ˌlɪbrəlaɪˈzeɪʃn, US -ləˈz-/ *noun*
1 ئازادکردن، ڕزگارکردن 2 ئاسانکاری، ئاسانگیری، جڵەوشلکردن، توندنەگرتن، شلگرتن ۞ 1 آزادسازی 2 تسهیل

**liberally** /-rəli/ *adverb*
1 ئازادانە: *Apply the cream liberally* 2 دلاوایانە، بەدەهەندانە، لە ڕووی دەسکراوەیی(یەوە) ۞ 1 آزادانه 2 سخاوتمندانه

**Liberal Party** *noun*

اجازه 3 حرف یا عمل گستاخانه 4 (در جمع) حقوق و امتیازات

**liberty boat** *noun*
گەمی مۆڵەت (مەلەوانەکان) ◌ قایق اجازه

**liberty cap** = cap of liberty

**Liberty Hall** *noun*
هاڵ یان سالۆنی ئازادی ◌ سالن آزادی

**liberty horse** *noun*
ئەسپی ئازاد یا بێ‌سوار (لە سیرکدا) ◌ اسب آزاد

**liberty man** *noun*
مەلەوانی ئازاد یان مۆڵەت‌پێدراو ◌ ملاح آزاد

**libidinal** *adjective*
سەربە لیبیدۆ (**libidinally** *adv*) ◌ وابسته به لیبیدو

**libidinous** /lɪˈbɪdɪnəs/ *adjective*
(فەرمی) شەهوانی، بەناڵۆش، هەوەساوی، ناگرتێ‌بەربوو، ناڵۆشاوی، بەهەوەس، زەنەک، هەرزە ◌ شهوانی، شهوت‌ران

**libidinously** /lɪˈbɪdɪnəsli/ *adverb*
بەناڵۆشانە، بە شێوەیەکی شەهوانی ◌ به طور شهوانی

**libidinousness** /lɪˈbɪdɪnəsnəs/ *noun*
بەناڵۆشی، بەهەوەسی، زەنەکی، هەرزەیی ◌ شهوت‌رانی

**libido** /lɪˈbiːdəʊ, ˈlɪbɪdəʊ, US -doʊ/ *noun, pl.* libidos
لیبیدۆ، ئارەزوو، ئیشتیا (بۆ سێکس)، هەوەس، پاڵنەر یان بزوێنەری سێکس، پاڵنەری سێکسی، سێکس‌بزوێن (لە لاتینەوە sexual drive، "lust ،desire") ◌ لیبیدو، سائق جنسی

**Libra** /ˈliːbrə/ *noun*
(کەلوو) تەرازوو (حەوتەمین کەلوو لە زۆدیاک، لە لاتینەوە) ◌ برج میزان

**libra** /ˈlaɪbrə/ *noun, pl.* librae /ˈlaɪbriː/
گروانکە، تەراز، تەرازە (لە رۆمی کۆندا: یەکەی کێشان بەرامبەر بە 12 ئەونس 0.34 کیلۆگرەم، لاتین "balance ،pound") ◌ گیروانکه

**Libran** *noun, adjective*
*n* (کەسێکی) لە کەلووی تەرازوودا (لەدایک)بوو *adj* 1 سەربە (کەلوو) تەرازوو 2 (لەدایک)بووی کەلووی تەرازوو ◌ *n* (آدم) متولد برج میزان *adj* 1 وابسته به برج میزان 2 متولد برج میزان

**librarian** /laɪˈbreəriən/ *noun*
کتێبەوان، کتێب‌پرس، بەرپرسی کتێب‌خانە ◌ کتاب‌دار

**librarianship** *noun*
کتێبەوانی، کتێب‌پرسی، بەرپرسایەتی کتێب‌خانە ◌ کتاب‌داری

**library** /ˈlaɪbrəri, ˈlaɪbri, US -breri/ *noun, pl.* libraries
1 کتێب‌خانە، نامەخانە: *a*

پارتی لیبراڵ ◌ حزب لیبرال

**liberated** /ˈlɪbəreɪtɪd/ *adjective*
پێشکەوتوو، پێشکەوتن‌خواز، نوێخواز، رۆشنبیر، بیرکراوە، تێگەیشتوو، رۆشن: *a -ated woman* ◊ *a liberated marriage* ◌ روشن‌اندیش، متجدد، باز

**liberation** /ˌlɪbəˈreɪʃn/ *noun*
1 رزگارکردن، ئازادکردن، بەردان، رزگاری، ئازادی 2 بزووتنەوەی رزگاریخوازی ◌ 1 آزادسازی، آزادی 2 جنبش آزادی‌خواهی

**liberation theology** *noun*
یەزدانناسی رزگاری‌خواز (بزووتنەوەی رزگاری‌خوازانە و دادپەروەرانەی قەشەکانی ئەمریکای لاتین) ◌ الیهات آزادی‌خواه

**liberator** /ˈlɪbəreɪtə(r)/ *noun*
زرگارکەر، ئازادگەر ، بەردەر ◌ آزادکننده، منجی

**Liberian** /laɪˈbɪəriən/ *noun, adjective*
*n* خەڵکی Liberia، وڵاتێ لە رۆژاوای ئەفریکا *adj* سەربە لیبیریا یا لیبیریاییەکان ◌ لیبریایی

**libertarian** /ˌlɪbəˈteəriən, US -bərˈter-/ *noun, adjective*
*n* 1 رزگاری‌خواز، ئازادی‌باوەر، ئازادی‌گەر 2 (Libertarian) ئەندامی پارتێکی رامیاری کە لایەنگری لە بنەماکانی ئازادی‌خوازی دەکا *adj* رزگاری‌خوازانە، ئازادی‌خوازانە ◌ *n* 1 آزادی‌خواه، اختیارگرا 2 (با L) عضو حزب آزادی‌خواه و طرف‌دار اصول آزادی‌خواهی *adj* آزادی‌خواهانه

**libertarianism** *noun*
ئازادی‌باوەری، ئازادی‌گەری (ویست و ئیرادە) ◌ اختیارگرایی

**libertinage** /ˈlɪbətɪnɪdʒ/ *noun*
هەرزەیی، بێ‌سەرەوبەرەیی، زەنەکی، داوێن‌پیسی، بێ‌ئاکاری ◌ فسق، بی‌بندوباری

**libertine** /ˈlɪbətiːn, US -bərt-/ *noun, adjective*
*n* 1 کەسێ کە پێبەندی دین نییە، ئازادبیری دینی 2 پیاوی هەرزە یان بێ‌سەرەوبەرە *adj* 1 بیرئازاد، نادەمارگرژ 2 زەنەک، داوێن‌پیس، پاشەڵ‌پیس ◌ *n* 1 آزاداندیشی مذهبی 2 مرد بی‌بندوبار *adj* 1 آزاداندیش 2 بی‌بندوبار، زن‌باره

**libertinism** *noun*
هەرزەیی، بێ‌سەرەوبەرەیی، داوێن‌پیسی، بێ‌ئاکاری ◌ فسق، بی‌بندوباری

**liberty** /ˈlɪbəti, US -bərti/ *noun, pl.* liberties
1 رزگاری، ئازادی، دەسەڵات 2 رێگەدان، مۆڵەت، دەستوور 3 وتە یان کردەوەیێکی رووداراوانە 4 (liberties) ماف و پریڤیلیجەکان (بنەرەت: لە *liberte* فەرەنسی کۆن، *libertas* لاتین، لە *liber* "free") ◌ 1 آزادی، اختیار 2

2 *public/reference/university, etc. library*
کۆمەڵەی تایبەتی کتێبەکان ◌ 1 کتابخانە 2 مجموعەی ویژەی کتابها

**library science** *noun*
زانستی کتێبڕاگرتن ◌ علم کتابداری

**libration** /laɪˈbreɪʃ(ə)n/ *noun*
ڕاژان، لەرینەوە، تەکەتەک، جووڵەی تەرازوویی ◌ نوسان

**libratory** /laɪbrətɔːrɪ/ *adjective*
لەرۆک ◌ نوسانگر

**librettist** /lɪˈbretɪst/ *noun*
لیبرێتۆنووس، نووسەری لیبرێتۆ، ئۆپێرانووس ◌ نویسندەی لیبرتو

**libretto** /lɪˈbretəʊ, US -toʊ/ *noun, pl.* libretti /-ti/ or librettos
لیبرێتۆ، دەقی ئۆپێرا، ئۆپێرانامە (بنەڕەت: لە ئیتالیاییەوە، چکۆلێتراوی *libro* "کتێب") ◌ لیبرتو

**Librium** /ˈlɪbriəm/ *noun*. trademark for chlordiazepoxide
لیبریێم، لیبریۆم (دەرمانێ بۆ کەمکردنەوەی دلەڕاوکێ) ◌ لیبریم

**Libyan** /ˈlɪbɪən/ *noun, adjective*
*adj* سەربە لیبیا یان لیبیاییەکان *n* خەڵکی لیبیا Lybia، لیبیایی ◌ *adj* وابستە بە لیبی *n* اهل لیبی

**lice** /laɪs/ = plural form of louse

**licence** /ˈlaɪsns/ *noun*, US license
1 دەستوورنامە، بڕوانامە: ◊ *a driving licence* ◊ *Is there a licence for the software?* 2 ئازادی جووڵانەوە 3 ودم، *licence fee?* دەستوور (ی فەرمی) 4 داوێنپیسی، بێسەرەوبەرەیی، هەرزەیی، خراپبەکارهێنانی ئازادی (بە ڕیگای فەرەنسەی کۆن لە *licentia* لاتین "freedom، licentiousness" (لە لاتینی "authority" سەدەکانی نێوەڕاست "permission"، لە *licere* "قانوونیبوون، ڕیگە پێدران") ◌ 1 پروانە، جواز، گواهینامە 2 آزادی عمل 3 اجازه (ی رسمی) 4 فسق، بیبندوباری

**licensed** /ˈlaɪsnst/ *adjective*
1 خاوەندەستوورنامە، دەستوورنامەدار، ڕیگەدراو، ڕێپێدراو: ◊ *Is that gun licensed?* 2 *She is licensed to fly solo* (ڕیستوران و هتد) خاوەندەستوورنامە بۆ فرۆشتنی خواردنەوەی ئەلکۆلی ◌ 1 با مجوز، مجاز، دارای جواز 2 دارندەی جواز فروش مشروبات الکلی

**licensed practical nurse** *noun*
نەخۆشیاری ڕیگەدراو یان دەستووردار ◌ پرستار مجاز

**licensed victualler** *noun*
(لە بریتانیا) فرۆشیاری ڕیگەپێدراوی خواردنەوە ئەلکۆلییەکان ◌ فروشندەی مجاز مشروبات الکلی

**licensee** /ˌlaɪsənˈsiː/ *noun*
1 خاوەندەستوورنامە، دەستوورنامەدار 2 خاوەندەستوورنامە بۆ فرۆشتنی خواردنەوەی ئەلکۆلی ◌ 1 دارندەی جواز یا پروانه 2 دارندەی جواز فروش مشروبات الکلی

**license number** = registration number

**license plate** – number plate

**licensing laws** *noun, pl.*
(لە بریتانیا) قانوونەکانی بەرتەسککردنەوەی فرۆشتنی (شوێنەکانی) خواردنەوە ئەلکۆلییەکان ◌ قوانین محدودیت فروش مشروبات الکلی

**licensure** *noun*
دەستوور، دەستوورنامە ◌ پروانه، جواز

**licentiate** /laɪˈsenʃiət/ *noun*
1 خاوەندەستوورنامە، دەستوورنامەدار 2 دەستوورنامە یان وردمی لێوەشاوەیی لە کار و پیشەیێ 3 (لە هێندێ زانکۆی بیانیدا) بڕوانامەیێ نێوان بەکالۆر و ماستێر و یان دوکتورا دا 4 ئامۆژگار یان وتاربێژی دینی ودمدراو، ئامۆژگاری ئازاد (لەسەر بنچینەی *licentia* "freedom") ◌ 1 دارندەی جواز 2 و 3 لایسنتیات 4 واعظ مجاز

**licentious** /laɪˈsenʃəs/ *adjective*
هەوەساوی، بەئالۆش، ئالۆشاوی، شەهوانی، ئاورگرتوو، زەنەک، هەرزە، داوێنپیس، ژنذۆست، بێسەرەوبەرە، هەڵەوهەرزە، بێئابروو (licentiously *adv*: بەئالۆشانە، زەنەکانە، بە شێوەیەکی هەوەساوی؛ licentiousness *n*: هەوەساویبوون، بەئالۆشی، ئالۆشاویبوون، ئاورگرتوویی، زەنەکی، شەهوانیبوون، هەرزەیی، داوێنپیسی، ژنذۆستی، بێسەرەوبەرەیی، هەڵەوهەرزەیی، بێئابڕوویی) ◌ شهوتران، شهوانی

**lichen** /ˈlaɪkən, US ˈlɪtʃən/ *noun*
1 کرێژەبەرد، قەوزەبەرد، قەوزە، چوزەوارە، بقز، گوڵکوچک، خەنەتیفک، گوڵکەفرۆک، بەردەچایی، گڵەوەز، چایی کێوی 2 جۆرێ نەخۆشی پێستی (زیپکە دەردەکا؛ lichened *adj*؛ lichenous *adj*؛ lichenology *n*، بنەڕەت: لە *leikhēn* یۆنانی) ◌ 1 گلسنگ 2 نوعی بیماری پوستی

**lichgate** /ˈlɪtʃgeɪt/ *noun*
دەروازەی سەرگیراو (قەبرستانی کلێسە، حەوشەی کلێسە)، درگا یان زوورگەی سەرگیراو، دالان ◌ مدخل سرپوشیده

**licit** /ˈlɪsɪt/ *adjective*
ڕەوا، ڕیگەدراو، قانوونی، یاسایی، قەدەغەنەکراو، زاکوونی، بەپێی زاکوون،

(جنی)پەنای باڵندە و ئاژەڵ ۞ 1 وضع 2 لای

**liebfraumilch** /ˈliːbfraʊˌmɪlʃ, German ˈliːpfraʊˌmɪlç/ *noun*
لیبفراومیلچ (جۆری مەی سپی ئەڵمانی) ۞ لیبفراومیلچ

**Liechtensteiner** /ˈlɪktənˌstʌɪnə, German ˈlɪçtnˌʃtaɪnɐ/ *noun*
دانیشتووی یان ڕەسەنی لیختینشتاین ۞ ساکن یا بومی لیختن‌اشتاین

**lie detector** *noun*
(دەزگا) درۆدۆز، درۆدەرخەر ۞ دروغ‌یاب

**lie-down** *noun*
کورتەپشوو، وچان، ورنگە، وەنەوەز، سەرخەو ۞ استراحت کوتاه

**liege** /liːdʒ/ *adjective, noun*
(مێژوویی) *adj* پێوەندی نێوان قاسال و دەرەبەگ *n* 1 خان، ئاغا، دەرەبەگ 2 رەعیەت، مسکین، گجە (بنەڕەت: بە ڕێگای *liege lige* فەرەنسی کۆن، لە *laeticus* لاتینی سەدەکانی نێوەڕاست، ڕەنگە بنەڕەتێکی ئەڵمانی هەبێ) ۞ *adj* رابطەی میان واسال و ارباب *n* 1 ارباب 2 رعیت

**liege lord** *noun*
خان، ئاغا، دەرەبەگ ۞ ارباب

**liegeman** /ˈliːdʒmən/ *noun, pl.* liegemen
(مێژوویی) ڕەعیەت، مسکین، گجە ۞ رعیت

**lie-in** *noun*
درەنگ‌هەستان، ترشان، نیوەڕۆخەو ۞ دیرپاشدگی

**lien** /ˈliːən/ *noun*
مافی ڕاگرتنی ماڵی قەرزار، مافی گلدانەوەی دارایی و ماڵی قەرزار (تا قەرزەکەی دەدرێتەوە) ۞ حق نگهداشتن دارایی بدهکار

**lienal** *adjective*
سەربە سپڵ، سپڵی ۞ وابسته به طحال یا سپرز

**lierne** /lɪˈɜːn/ *noun*
(بیناسازی) چینی تاقی (بۆ) جوانی ۞ تویزەی تزیینی

**lieu** /luː, US ljuː/ *noun,* in lieu of
لە جیاتی، لە بڕتی، بەجێی، لەبری (بنەڕەت: لە *locus* لاتین "شوێن") ۞ به جای

**Lieut** = lieutenant

**lieutenancy** /lefˈtenənsɪ, US luːˈt-/ *noun*
1 قایم‌مقامی، ناوچەداری، کارگێری، جێگری 2 پلە(وپایە) یان پۆستی لیفتێنێنسی یان سێتوانی ۞ 1 قائم‌مقامی، نیابت 2 درجه یا پوست ستوانی

**lieutenant** /lefˈtenənt, US luːˈt-/ *noun*
1 ئەفسەرێکی پایەنێوان لە ئەرتەش، هێزی دەریایی و ئاسمانی‌دا 2 ناوچەدار، کارگێر، قایم‌مقام، جێگر ۞ 1 ستوان 2 قایم‌مقام، نایب

**lieutenant colonel** *noun*
پلەی ئەفسەری ئەرتەشی هێزی ئاسمانی ئەمریکا، لە ژوور major و خوارووی colonel

بە ...licitly *adv*) lawful ,permissible: بـە شێوەیەکی ڕەوا یان قانوونی، بنەڕەت: لە *licere licitus* لاتین "ڕێگەدان") ۞ مجاز، قانونی، مشروع

**lick** /lɪk/ *noun*
1 لستنەوە، لیسانەوە، زمان‌پیاهێنان، جێگای لستنەوە، لیسایی 2 بڕێکی کەم، خێرایی ۞ 1 لیسش، لیسگاه 2 مقدار کم، سرعت

**lickerish** /ˈlɪkərɪʃ/ *adjective*
1 = lecherous 2 (کۆن) چلێس، greedy ع desirous (adv :lickerishly 1 زەنەکانە، هەرزانە 2 (کۆن) چلێس؛ lickerishness *n*) ۞ حریص

**lickety-split** *adverb*
بە ئەوپەڕی خێراییەوە، بە توندی توند ۞ با سرعت تمام

**licking** /ˈlɪkɪŋ/ *noun*
1 لستنەوە، لیسانەوە، زمان‌پیاهێنان 2 تێ‌شکان، بەزین، دانان، دۆڕاندن 3 کوتەک‌کاری، لێدان ۞ 1 لیسش 2 شکست، باخت 3 ضربت با چوب

**lickspittle** /ˈlɪkspɪtl/ *noun*
(کەسێکی) کاسەلیس، ڕووپاما، کلکەسووتێ‌کەر ۞ کاسه‌لیس، چاپلوس

**licorice** = liquorice

**lictor** /ˈlɪktə/ *noun*
(لە ڕۆمی کۆن‌دا) تەورهەڵگر، تەوردار، بەرپرس یا کاربەدەست یا ئەفسەری جێبەجێ‌کردن یا سزادان ۞ تبردار، مأمور اجرا یا مجازات

**lid** /lɪd/ *noun*
1 سەرپۆش، سەرقاپ، سەرقەپاخ، درگا، سەر، دەرەگۆزنو، خوانکە، دەرخونە 2 پەردەی چاو، پێڵوو، بەڵک، کۆپک 3 (ڕووەک‌ناسی) سەرپۆش، سەر (lidless *adj*: بێ‌سەرپۆش، بێ‌درگا، بێ‌سەرقاپ، بێ‌سەر) ۞ 1 سرپوش، در، سر، نهنبان 2 پلک 3 (گیاه‌شناسی) سرپوش

**lidded** /ˈlɪdɪd/ *adjective*
بەسەر، سەردار، درگادار، سەرقاپ‌دار: *heavily-lidded eyes* ۞ دارای در

**lido** /ˈliːdəʊ, US -doʊ/ *noun, pl.* lidos
ئەستێر (سەری نەگیرا بێ) ۞ استخر

**lidocaine** /ˈlɪdəkeɪn, US -dəʊk-/ *noun,* also lignocaine
لیدۆکائین (= جۆری دەرمانی $C_{14}H_{22}N_2O$ بۆ سڕکردنی شوێنی، وەک دەرهێنانی ددان و...، ((from cocaine) *-caine + (acetani)lid(e)* ۞ لیدوکائین

**lie**[1] /laɪ/ *noun*
درۆ، فڕا، مایەی هەڵفریواندن یا لەخشتەبردن ۞ دروغ، مایەی گول زدن

**lie**[2] /laɪ/ *noun*
1 ڕەوش، باروودۆخ، دۆخ 2 شوێنی خەو یان

⬡ سرهنگ دوم

**lieutenant commander** *noun*
پلـەی ئەفـسـەری هێـزی دەریـایی، لـە ژوور lieutenant و خـوارووی commander ⬡ ناوسروان

**lieutenant general** *noun*
ئەفسەریکی پایەبەرزی ئەرتەش، لە ژوور major general و خوارووی general ⬡ سرهنگ دوم

**lieutenant governor** *noun*
کارگێر یا جێگری ستانوان ⬡ جانشین فرماندار

**life** /laɪf/ *noun, adjective, pl.* lives
*n* 1 ژیان، ژین، ژی، گیان، زیندەیی، هەیش، جان، رۆح 2 بوونەوەری زیندوو، زیندەوەر 3 تەمەن، عومر، عەمر، رستی سال، سیرە، درێژایی تەمەن 4 کەس 5 سەرچاوەی ژیان یان تین‌وگوڕ، چالاکی، بەگوڕی، گورجی، جم‌وجۆڵ، تین‌وگوڕ، شەوق، لەجۆشی 6 ژیان‌نامە، سەربردەی ژیان 7 مودێلی زیندوو 8 زیندانی هەمیشەیی *adj* 1 هەمیشەیی، هەتاهەتایی، تاسەر 2 زیندوو، زندی ⬡ *n* 1 حیات، زندگی، جان 2 موجود زنده 3 عمر، طول عمر 4 شخص 5 مبدأ سرزندگی، فعالیت، نشاط 6 بیوگرافی 7 مدل زنده 8 حبس ابد *adj* 1 مادام‌العمر 2 زنده

**life-and-death** *adjective*
رشت، گرنگ، سەربە مەرگ و ژیان، مەرگ و ژیانی تیایە، تا گیانم تیابێ، تاسەری مەرگ ⬡ جدی، مهم، خطیر، تا پای جان

**life annuity** /ˈlaɪf ənju:ətɪ/ *noun*
(دارایی) برانە یان سالانەی هەمیشەیی ⬡ مقرری مادام‌العمر

**life assurance** = life insurance

**lifebelt** /ˈlaɪfbelt/ *noun*
ئاڵقەی رزگاربوون، پشتێنەی پارێزران، پشتێنەی قوم‌نەبوون، کەمەری قوم‌نەبوون ⬡ کمربند نجات

**lifeblood** /ˈlaɪfblʌd/ *noun*
1 خوێنی ژیان 2 مایەی ژیان، مایەی مانەوە، گەوهەر 3 فرین (پێڵووی چاو) ⬡ 1 خون حیات 2 عامل حیات 3 لایف‌بلود

**lifeboat** /ˈlaɪfbəʊt, US -boʊt/ *noun*
1 بەلەمی رزگاربوون، گەمی رزگاربوون 2 گەمی تەنگەتاوی سەرکەشتی ⬡ 1 قایق نجات 2 لایف‌بوت

**lifebuoy** /ˈlaɪfbɔɪ, US ˈbu:i/ = lifebelt

**life cycle** *noun*
سووڕی ژیان ⬡ چرخەی زندگی

**life expectancy** *noun*
درێژایی تەمەن، تەمەنی باش و بەقازانج، ئەگەری درێژایی تەمەن، هیوای ژیان ⬡ طول عمر، عمر مفید، احتمال طول عمر، احتمال طول عمر

**life force** *noun*
هێزی ژیان، هێزی زیندوویێتی، هاندەری ژیان ⬡ نیروی زندگی

**life form** *noun*
بوونەوەری زیندوو، زیندەوەر ⬡ موجود زنده

**life-giving** *adjective*
بووژێنەر، ژێنەرەوە، ژیان‌پێدەر، گیان‌پێدەر، گەشەپێدەر، وەگوڕخەر، گورج‌کەرەوە، کەیف‌پێدەر، چالاک‌کەر، هێزپێدەر ⬡ حیات‌بخش، مفرح

**lifeguard** /ˈlaɪfgɑ:d, US -gɑ:rd/ *noun*
مەلەوانی رزگارکەر، ژین‌پارێز ⬡ نجات غریق

**Life Guards** *noun, pl.*
(لەبریتانیا) هێزی سوارەی پاتشایی، سپای سوارەی گاردی پاتشایی ⬡ گارد سوارە‌نظام سلطنتی

**life history** *noun*
مێژووی ژیان، تۆمارەی سووڕی ژیانی ئۆرگانیزمێ (سەرجەم ئەو رووداو و گۆڕان‌کاری‌یانە کە بەدرێژایی ژیانی بوونەوەریکی زیندوو روویان داوە) ⬡ تاریخ‌چەی زیستی یا زندگی

**life imprisonment** *noun*
زیندانی هەمیشەیی ⬡ حبس ابد

**death instinct** *noun*
زگماکە یان ئینستینکتی ژیان، – Eros ⬡ غریزەی زندگی

**life insurance** *noun,* also life assurance
بیمە یان ئینشورانسی ژیان، بیمەی تەمەن ⬡ بیمەی عمر

**life-jacket** *noun*
جلیسقەی رزگاربوون، سیخمەی قوم‌نەبوون ⬡ جلیقەی نجات

**lifeless** /ˈlaɪfləs/ *adjective*
1 بێ‌گیان، مردوو، نازیندوو، بێ‌جان، dead، 2 ناخۆش، پڕوپووچ، ماندووکەر، inanimate وەڕەس‌کەر (lifelessly *adv*: 1 بە شێوەیێکی بێ‌گیان 2 وەڕەس‌کەرانە، وەڕەزکەرانە؛ lifelessness *n*: 1 بێ‌گیانی 2 وەڕەسکەری، هیچی، ناخۆشی) ⬡ 1 بی‌جان، مرده 2 ملال‌آور

**lifelike** /ˈlaɪflaɪk/ *adjective*
زیندوو، زیندووئاسا، زیندووئوێن، زیندوودیار، وەکوو زیندوو ⬡ زنده‌نما

**lifeline** /ˈlaɪflaɪn/ *noun*
1 تەناف یا پەتی رزگاربوون 2 (دەست) هێڵی تەمەن 3 (خوازە) شاڕێ، یەکجارگرنگ ⬡ 1 طناب نجات 2 خط عمر 3 (مجازی) رگ حیاتی

**lifelong** /ˈlaɪflɒŋ, US -lɔ:ŋ/ *adjective*
هەمیشەیی، بەدرێژایی تەمەن، هەتاسەر، تاسەر، هەتاهەتایی، لەمێژینە، long-standing ⬡ مادام‌العمر، دیرپایی

**life member** *noun*
ئەندامی هەمیشەیی یان تاسەر ( life membership *n*: ئەندامێتی هەمیشەیی یان

*n* 1 تەمەن، عومر، ماوەی ژیان، درێژایی تەمەن 2 ڕۆژگار *adj* هەمیشەیی ◌ *n* 1 عمر، مدت زندگی 2 زمان *adj* مادام‌العمر

**life zone** *noun*

ناوچەی ژیانی (هی گیانەوەر یا ڕووەکێکی تایبەتی) ◌ منطقەی حیاتی

**life-vest** = life-jacket

**life-work** /ˌlaɪfˈwɜːk, US ˈwɜːrk/ *noun*

1 چالاکی یان مەبەستی سەرەکی کەسێ لە ژیانی‌دا، چالاکی سەرەکی ژیان، بەرهەمی عومر یان تەمەن، کاری هەمیشەیی 2 بەرهەمی ژیان یان تەمەن 3 ئەنجامی ژیان ◌ 1 فعالیت یا هدف اصلی شخصی در زندگی، کار دائمی 2 نتیجەی زندگی

**lift** /lɪft/ *noun*

1 بەرزکردنەوە، هەڵێنان، هەڵگرتن، بڵیندکردن، بردنەسەر(ەوە) 2 دزی، هەڵگرتن 3 پێشکەوتن، پێشوەچوون 4 بەرزکەرە، هەڵگرە، ئاسانسۆر 5 (ماشین و خۆڕایی) سواری 6 بارهەڵگر 7 سەرخۆشی، سووکی، بەدەماخی، بەکەیفی، خۆشحاڵی 8 یارمەتی، کۆمەک 9 چالاکی 10 هەستان، ڕابوون 11 (فڕۆکە) هێزی سەرەوەبەر (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ 1 عمل بلند کردن 2 سرقت 3 ترقی 4 آسانسور 5 سواری (مجانی) 6 باربردار 7 وجد، سرحالی 8 کمک 9 فعالیت 10 خیز 11 نیروی بالابرنده

**lift-attendant** *noun*, also liftboy or liftman

بەرپرسی بەرزکەرە، ئاسانسۆرچی، بەرزکەرەوان ◌ آسانسورچی

**lift-off** *noun*

(مووشەک، کەشتی ئاسمانی و هتد) ڕاخوشان، بەرزبوونەوە، هەستان، ڕابوون (ئاسۆیی) ◌ خیزش

**lift van** *noun*

سنووقچەی قایم یا ڕەختە ◌ صندوقچەی محکم

**ligament** /ˈlɪgəmənt/ *noun*

1 پێ‌بەست، جومگەبەند، ئێسکەبەند، بەند، ئێسکبەست 2 پێوەند، پەیوەند، پێک‌بەند، (پێک‌)بەست: *The desire for freedom is a ligament uniting all peoples* (ligamentous *adj*، ligamentously *adv*) ◌ 1 رباط 2 پیوند

**ligamental** *adjective*

پێ‌بەستی، سەربە پێ‌بەست، سەربە جومگەبەند، سەربە ئێسکبەند ◌ وابستە بە رباط، رباطی

**ligamentary** *adjective*, also ligamentous /ˌlɪgəˈmentəs/

پێ‌بەستی، سەربە پێ‌بەست، سەربە جومگەبەند، سەربە ئێسکبەند یا ئێسکبەست ◌ وابستە بە رباط

**ligand** /ˈlɪg(ə)nd/ *noun*

(کیمیا و زیندەکیمیا) لیگاند، بەستەک؛ گەردێ کە بە یەکێکی تر دەبەسترێتەوە (لە *ligandus* لاتین "کە دەتوانێ ببەسترێ") ◌ لیگاند

تاسەر) ◌ عضو مادام‌العمر

**life net** *noun*

تۆڕی ڕزگاربوون ◌ تور نجات

**life office** *noun*

کۆمپانی یان نووسینگەی بیمەی تەمەن ◌ شرکت یا دفتر بیمەی عمر

**life of Riley** *noun*

ژیانی ئاسوودە، ژیانی بێ‌دەردەسەر ◌ زندگی راحت

**life-or-death** = life-and-death

**life preserver** *noun*

کەرەسەی ڕزگاربوون، شتی ڕزگاربوون (وەکوو پشتێنەی ڕزگاربوون، جلیقەی ڕزگاربوون و هتد) ◌ وسیلەی نجات

**lifer** /ˈlaɪfə(r)/ *noun*

1 (نافەرمی، زیندانی) هەمیشەیی 2 کەسێ کە تەواوی ژیانی لە کارێک‌دا بردۆتەسەرێ، ب.ت. هێزە چەکدارەکان ◌ 1 ابدی 2 لایفر

**life-raft** *noun*

بەلەمی ڕزگاربوون، گەمی ڕزگارکردن، بەلەمی تەنگەتاوی (ب.ت. بای تێدەکرێ) ◌ قایق نجات

**life-saver** /ˈlaɪfseɪvə(r)/ *noun*

1 (ب.ت. ئەوستڕالیا و نیوزیلەند) مەلەوانی ڕزگارکەر 2 (خوازە) نێعمەت، ڕزگارکەر، بەرەکەت ◌ 1 نجات غریق 2 نعمت

**life sciences** *noun, pl.*

زیندەناسی و بابەتەکانی پێوەندیدار (life scientist *n*) ◌ علوم زیستی

**life sentence** *noun*

بڕیاری زیندانی هەمیشەیی، سزای زیندانی هەمیشەیی ◌ حکم زندان ابد

**life-size** *adjective*, also life-sized

(مودیل یان وێنەیێ) (بە) ئەندازەی خۆی، ئەندازەی سروشتی: *a life-size statue* ◌ اندازەی طبیعی

**life-span** /ˈlaɪfspæn/ *noun*

تەمەن، درێژایی تەمەن ◌ طول عمر

**life story** *noun*

ژیان‌نامە، ژین‌نامە، چیرۆک یان داستانی ژیان ◌ زندگی‌نامە

**life-style** /ˈlaɪfstaɪl/ *noun*

شێوەی ژیان، شێوازی ژیان ◌ سبک زندگی

**life-support** *noun*

(دەزگای) پاراستنی ژیان ◌ (دستگاه) حفظ حیات

**life-support machine** = life-support system

**life-support system** *noun*

(کەشتی ئاسمانی) دەزگای پاراستنی ژیان ◌ دستگاه حفظ حیات

**life-threatening** *adjective*

کوشندە، هەڕەشە لە ژیان دەکا ◌ مهلک

**lifetime** /ˈlaɪftaɪm/ *noun, adjective*

**ligase** /ˈlɪgeɪz/ *noun*, also synthetase
بەستەهەوێنە، لیگاز: هەوێنەیێ کە کاری ligation دابین دەکا ◌ لیگیز

**ligation** /lɪˈgeɪʃn, US laɪˈg-/ *noun*
بەستن، گرێدان، بەستنی رەگ (ligative *adj*) ◌ عمل بستن، بستن رگ

**ligature** /ˈlɪgətʃə(r)/ *noun*
1 لیگێچێر، لیگاتور، رەگبەست 2 (موسیقا) لیکدان، پێکەوەبەستن، نیشانە یان هێڵی پێکەوەبەستن 3 (چاپ) دووتییە، پیتی دوانە، پیتەنووساو، پیتی (پێکەوە) لکاو (وەکوو œ) ◌ 1 لیگاتور 2 (موسیقی) اتصال یا نشان یا خط اتصال 3 (چاپ) حرف مرکب

**liger** /ˈlʌɪgə/ *noun*
شێربەور (دوورەگەی شێری نێر و بەوری مێ، بڕوانە tigon) ◌ لیگر

**light**[1] /laɪt/ *noun*
1 رۆشنایی، شەوق، رووناکی، تیرۆژ، لیزگ، سەرچاوەی رووناکی، سەرچاوەی رۆشنایی (ب.ت. گڵۆپی ئێلیکتریکی) 2 چرا 3 شەمچە، گورت، چەرخ، ئاور 4 برووسکانەوە، درەوشانەوە، بریقانەوە 5 رۆچنە، کلاوڕۆژنە، باڵاڕوان، کولاوکە، تەشابی، مەزد، کولەک، دەلاقە 6 لایەن، ئالی، بوار 7 تێگەیشتن، پێبردن 8 رۆشنگەری، enlightenment 9 بەشێ لە وێنە کە رۆشنایی بخرێتەسەر، رووناکایی 10 کەسایەتی بەرز یان گەورە 11 (lights) توانایی 12 چراکانی هاتوچۆ یان ترافیک (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ 1 نور، روشنی، پرتو، منبع نور 2 چراغ 3 کبریت، فندک، آتش 4 درخشش 5 روزنه 6 جنبه 7 درک 8 تنویر 9 لایت 10 شخصیت بارز، چهره 11 (در جمع) استعداد 12 چراغ‌های ترافیک

**light**[2] /laɪt/ *adjective*
1 رووناک، رۆشن، پڕشەوق 2 کەمڕەنگ، کاڵ 3 سووک، سڤک، نەقورس، کێشی کەم، کەم، چکۆلە، ناگرنگ، (خەو) نەقووڵ، سووک 4 کەم، هێچەکە، ناسک، نیان 5 (جلوبەرگ) ناسک، تەنک، هاوینی 6 سادە، ئاسان، ئاسانتێگەیشتوو 7 (چێشت) سووک، زووهەرس، قورس نییە، ناگران 8 نەرشت 9 خۆشحاڵ، ئانیگەران، شاد، بەکەیف 10 سست، ناسک، ناقایم، نارەختە 11 (کۆن، ژن) سووک، بێسەروبەرە، بێئابروو، هەرزە، بێناموس ◌ 1 پرنور 2 کم‌رنگ 3 سبک، کم‌وزن، خفیف 4 کسری، کوچک، مختصر، کم‌اهمیت، ظریف 5 (لباس) نازک 6 ساده 7 زودهضم 8 غیرجدی 9 خوشحال 10 سست، نامحکم 11 بی‌بندوبار

**light**[3] /laɪt/ *adverb*
سووک، بێبار، کەمبار ◌ سبک

**light adaptation** *noun*
گونجان یا سازان بە رۆشنایی، داهاتن بە رووناکی، چاو خۆی لەگەڵ بارودۆخەکە دەگونجێنێ (light-adapted *adj*) ◌ سازگاری به نور

**light air** *noun*
بای سووک (خێرایی با لە 1 تا 5 کیلۆمیتر لە سەعاتدا) ◌ لایت ایر

**light aircraft** *noun*
فڕۆکەی سووک، فڕۆکەی چکۆلانە، سووکە فڕۆکە ◌ هواپیمای سبک

**light ale** *noun*
بیرەی تراو ◌ آبجوی رقیق

**light armed** /ˌlaɪt ˈɑːmd/ *adjective*, also light-armed
چەکسووک ◌ سبک‌اسلحه

**light bread** *noun*
نانی سپی یان سووک (زۆرتر لە Southern و Midland) ◌ نان سفید

**light bulb** *noun*
گڵۆپ، لامپ ◌ لامپ

**light chain** *noun*
زنجیرەی سووک (بڕوانە heavy chain) ◌ لایت چین

**light curve** *noun*
چەماوەی رووناکی یان رۆشنایی (رۆشنایی شت یان تەنێکی ئاسمانی (وەک ئەستێرەی بگۆڕ) لە ماوەییدا) ◌ منحنی لایت

**light-coloured** *adjective*
رەنگی کاڵ، گەش، توخ نەبێ، رەنگی رۆشن ◌ رنگ روشن

**light-emiting diode** = LED

**light engine** *noun*
لۆکۆمۆتیڤی بێعەرەبانە، لۆکۆمۆتیڤی سووک ◌ لایت اینجاین

**lighter**[1] /ˈlaɪtə(r)/ *noun*
چەرخ، چەخماخ، فەندەک، فەنەک، ئەستێ، داگیرسێنەر، ئاورکەرەوە، ئاگرداگیرسێنەر ◌ فندک، گیرانه، لایتر

**lighter**[2] /ˈlaɪtə(r)/ *noun*
گەمیی باری، بەلەمی بارهەڵگر، لۆتکەی بارهەڵگر ◌ دوبه

**lighterage** /ˈlaɪtərɪdʒ/ *noun*
راگوێستن بە گەمیی باری، کرێی راگوێستن بە lighterage ◌ لایتراژ

**lighterman** *noun, pl.* lightermen
گەمییەوانی باری ◌ دوبه‌ران

**lighter-than-air** *adjective*
(لەمەڕ فڕۆکەوە) سووکتر لە هەوا ◌ سبک‌تر از هوا

**lightface** *noun, adjective*
*n* ئەو پیتە چاپییانەی کە هێڵکانی باریک و وردن *adj* (هەروەها lighterfaced) نووسراو بەو پیتە چاپییانە (بڕوانە boldface) ◌ لایت‌فیس

تحت‌اللفظی 2 حقیقتاً

**literarily** *adverb*
بە شێوەیەکی وێژەیی یان ئەدەبی، وێژەیی‌یانە ◌ بە طور ادبی

**literary** /ˈlɪtərəri, US -reri/ *adjective*
1 وێژەیی، ئەدەبی، سەربە وێژە یان تۆرە: 2 *literary criticism/theory* ئەدەبیانە، وێژەوانانە ◌ 1 ادبی، وابستە بە ادبیات 2 ادبیانە

**literary critic** *noun*
رەخنەگری وێژەیی ◌ منتقد ادبی

**literary criticism** *noun*
رەخنەی وێژەیی ◌ نقد ادبی

**literary historian** *noun*
مێژوونووسی وێژە ◌ تاریخ‌دان ادبیات

**literary history** *noun*
مێژووی وێژەیی یا وێژە ◌ تاریخ ادبی یا ادبیات

**literate** /ˈlɪtərət/ *adjective, noun*
*adj* خوێندەوار، میرزا، رۆشنبیر، رووناکبیر: *Though nearly twenty he was barely literate n* مرۆی خوێندەوار ◌ *adj* باسواد، روشن‌فکر *n* آدم باسواد

**literati** /ˌlɪtəˈrɑːti/ *noun, pl.*
1 وێژەوانان، گەلی وێژەوانان: *He was underrated as a writer by the -ti* 2 چینی رۆشنبیر، intelligentsia ◌ 1 ادبا 2 طبقەی تحصیل‌کردە

**literatim** /ˌlɪtəˈrɑːtɪm, US -ˈreɪtɪm/ *noun*
(لاتین) پیت‌بەپیت، دەقاودەق، وشەبەوشە: *printed literatim from the manuscript — I. A. Gordon* ◌ حرفی

**literature** /ˈlɪtrətʃə(r), US -tʃʊr/ *noun*
1 ویژە، تۆرە، ئەدەب(یات)، شوێنەواری وێژەیی(یەکان) 2 (نافەرمی) نامیلکە ◌ 1 ادبیات، آثار ادبی 2 (عامیانە) جزوە

**-lith** *suffix*
پاشگر: بەردین، لە بەرد: *megalith*، *monolith*، *laccolith*، *urolith*، *eolith* (بنەڕەت: لە *lithos* یونانی "stone") ◌ پسوند: وابستە بە صخرە یا سنگ

**litharge** /ˈlɪθɑːdʒ/ *noun*
بەردەمردوو، بەردەمردە، بەردەزیو ◌ مردارسنگ

**lithe** /laɪð/ *adjective*
نەرم، شلک (کە دەتوانی دایتەوە یان وەرسووڕێ)، لەش‌نەرم، بە لەشێکی نەرمەوە: *a tall lithe figure* (lithely /ˈlaɪðli/ *adv*): بە شێوەیەکی نەرم: *She moved -ely to the music*) ◌ نرم، دارای بدن نرم

**litheness** *noun*
نەرمی، شلکی ◌ نرمی

**lithesome** /ˈlaɪðsəm/ *adjective*
(وێژەیی) نەرم ◌ نرم

**lithia** /ˈlɪθɪə/ *noun*
(کیمیا) ئۆکسایدی لیتیۆم lithium oxide، لیتیا ◌ لیتیا

**lithiasis** /lɪˈθaɪəsɪs/ *noun, pl.* lithiases
(پزشکی) پێکهاتنی بەرد لە نێو ئەندامی، وەک گورچیلە و یان توورەکەی زراو gall bladder ◌ لیتیاز

**-lithic** *suffix*
پاشگر: بەردین، بەردی (بنەڕەت: لە *lithos* یونانی‌یەوە "بەرد") ◌ پسوند: سنگی

**lithification** *noun*
بەرداندن، کردنەبەرد، گۆڕین بۆ بەرد ◌ تبدیل بە سنگ

**lithium** /ˈlɪθiəm/ *noun*
1 لیتیۆم (بە ژ.گ. 3، ن. Li) 2 خوێی لیتیۆم ◌ 1 لیتیم 2 نمک لیتیم

**lithium carbonate** *noun*
کاربۆناتی لیتیۆم ◌ کربونات لیتیم

**lithium fluoride** *noun*
فلۆرایدی لیتیۆم ◌ فلورید لیتیم

**lithium niobate** *noun*
نیۆبات لیتیۆم ◌ نیوبات لیتیم

**litho** /ˈlaɪθəʊ, US ˈlɪθ-/ *noun, pl.* lithos
(نافەرمی) لیسۆگرافی، لیتۆگرافی ◌ لیتوگرافی

**litho-** *prefix*
پێشگر: 1 بەرد، کەڤر: *lithosol* 2 calculus: *lithotomy* (بنەڕەت: لە *lithos* یونانی‌یەوە "stone") ◌ پیشوند: 1 سنگ 2 calculus

**lithograph** /ˈlɪθəgrɑːf, US -græf/ *noun*
وێنەی چاپکراو یان چاپی ◌ تصویر چاپی

**lithographic** /ˌlɪθəˈgræfɪk/ *adjective*
سەربە لیتۆگرافی ◌ وابستە بە لیتوگرافی

**lithography** /lɪˈθɒgrəfi, US -ˈθɑːg-/ *noun*
لیتۆگرافی، چاپی بەردین، بەردەچاپ ◌ لیتوگرافی

**lithoid** /ˈlɪθɔɪd/ *adjective*, also lithoidal
بەردین ◌ سنگی

**litholatry** *noun*
بەردپەرستی ◌ سنگ‌پرستی

**lithological** *adjective*
سەربە بەردناسی ◌ سنگ‌شناختی

**lithologist** *noun*
بەردناس ◌ سنگ‌شناس

**lithology** /lɪˈθɒlədʒi, US lɪˈθɑːl-/ *noun*
بەردناسی ◌ سنگ‌شناسی

**lithophyte** /ˈlɪθə(ʊ)faɪt, US ˈlaɪ-/ *noun*
گیا یان رووەکی لەسەر بەرد شین‌بوو، رووەکی بەردەژی، گیای بەردین، گیابەردینە ◌ گیاه سنگ‌زی

**lithopone** /ˈlɪθəpəʊn/ *noun*
پیگمێنت یان رەنگی سپی کە لە سولفایدی چینکۆ یا زینک zinc sulphide و سولفاتی

باریۆم barium sulphate پێکهاتووە ◌ لیتوپون
**lithops** = living stones
**lithosol** *noun*
بەردەخاک، خاکەبەردینە، بەردەگڵ: هەریەک لەو کۆمەڵە گڵ یا خاکە azonal و کەمقووڵانە کە بە نیوەچلی لەو بەشە بەردینە تاوبردووانە یا نیوەگلانە پێکهاتوون ◌ لیتوسول
**lithosphere** /ˈlɪθəsfɪə(r), US -sfɪr/ *noun*
توێکلی زەوی، چینەبەردینە، لیتۆسفێر، بەردەگۆ ◌ سنگکره
**lithospheric** *adjective*
سەربە توێکلی زەوی، بەردەگۆیی، چینەبەردینەیی ◌ وابسته به سنگکره
**lithotomist** *noun*
لیتوتۆمیست ◌ لیتوتومیست
**lithotomy** /lɪˈθɒtəmi/ *noun, pl.* lithotomies
لیتوتۆمی (لابردنی بەرد لە میزەڵدان، گورچیلە و هتد) ◌ لیتوتومی
**lithotripsy** /ˈlɪθəˌtrɪpsi/ *noun*
بەردەشکێ، بەردەهاڕێ، شکاندنی بەردی نێو لەش ◌ لیتوتریپسی
**lithotriptic** *adjective*
سەربە بەردەشکێ ◌ وابسته به لیتوتریپسی
**Lithuanian** /ˌlɪθuːˈeɪnɪən/ *adjective, noun*
*adj* سەربە لیتوانیا، خەڵکەکەی یان زمانەکەی، لیتوانیایی *n* 1 خەڵک یان هاووڵاتی لیتوانیا، یان لە رەچەڵەکی لیتوانیایی یان لیتوانی 2 زمانی باڵتیکی لیتوانیایی ◌ *adj* لیتوانیایی *n* 1 اهل لیتوانی 2 زبان لیتوانی
**litigable** /ˈlɪtəgəbl/ *adjective*
کێشەلەسەر ◌ متنازع‌فیه
**litigant** /ˈlɪtɪgənt/ *noun*
دادخواز، دادبەر، لایەنی داوا ◌ طرف دعوا، متداعی
**litigation** /ˌlɪtɪˈgeɪʃn/ *noun*
دادبەری، دادخوازی، داوا ◌ اقامه‌ی دعوا، دعوا
**litigious** /lɪˈtɪdʒəs/ *adjective*
کێشەلەسەر، مشتومڕاوی، سەربەکێشە، سەربەگۆنگەڵ، گێچەڵباز، disputatious، contentious ◌ متنازع‌فیه، اهل مرافعه
**litigiously** /lɪˈtɪdʒəsli/ *adverb*
کێشەلەسەرانە، بە شێوەیێکی مشتومڕاوی ◌ به طور متنازع‌فیه
**litigiousness** /lɪˈtɪdʒəsnəs/ *noun*
سەربەکێشەبوون، سەربەگۆنگەڵی، گێچەڵبازی، سەربەگێچەڵی ◌ اهل مرافعه بودن
**litmus** /ˈlɪtməs/ *noun*
1 رەنگی گوڵەبەرۆژە، قەوزەرەنگ، لیتمۆس (= کەرەسەیێ بە رەنگی شین، ئەگەر ترشەڵۆکی لێبدرێ سوور دادەگەرێ و ئەگەر تفتی پیابکرێ شین دەبێتەوە) 2 = litmus test ◌ تورنسل
**litmus paper** *noun*
کاغزی لیتمۆس ◌ کاغذ تورنسل
**litmus test** *noun*
1 پێوەری دیاریکەر 2 تاقیکردنەوەیێ کە لیتمۆس بەکاردێنێ ◌ 1 محک 2 لیتموس تست
**litotes** /laɪˈtəʊtiːz, US -ˈtoʊ-/ *noun*
جەختکردنەوەی پێچەوانە، بەکارهێنانی رستەی نەیینی بۆ جەختکردنەسەر واتای پێچەوانەکەی (وەک «کارێکی ئاسان نەبوو *It wasn't easy*» بە واتای «کارێکی زۆر سەخت بوو *It was very difficult*») ◌ کوچک‌انگاری
**litre** /ˈliːtə(r)/ *noun*, US liter
لیتر ◌ لیتر
**litreage** /ˈliːt(ə)rɪdʒ/ *noun*
لیترپێو(کردن)، لیتراژ ◌ لیتراژ
**Litt D** = D Litt
**litter** /ˈlɪtə(r)/ *noun*
1 زبڵوزاڵ، گەنوگووزاڵ، پاشەماوە، ئەشغاڵ (ب.ت. وردە کاغز و قوتوی فڕێدراو و بێکارە): *There will be fines for people who drop litter* 2 شپرزەیی، شێواوی، تێکەوڵێکەیی 3 بووشوپەلاش، پەینوپاڵ، کا(وکوت، بۆ ژێر پاتاڵ) 4 بێچووەکان، بەرەزا، بەرەزگ، بەچکەکان (هی گیانەوەرێ کە بە یەک جار زاون) 5 دەستەبەرە 6 کەژاوە 7 تەختەپەیین، گەمرە، کەمرە، کەپرە ◌ 1 آت و آشغال 2 آشفتگی، ریخته‌پاشیدگی 3 کاه 4 توله‌ها 5 برانکار 6 تخت روان، محمل 7 تخته‌ی پهن
**littérateur** /ˌlɪtɒrɑːˈtɜː/ *noun*
(فەرەنسی) ویژەوان، تورەڤان ◌ ادیب
**litter-bin** *noun*, also litter-basket
زبڵدان، تەنەکەخۆڵ ◌ سطل آشغال
**litterbug** *noun*, also litter lout
مرۆ یان بنیادەمی پیسوچەپەڵ، توورەکە زبڵی کون (برێتییە لەو کەسەیێ کە لە وردەکاغز و قوتو و شت بەردەدانەوە) ◌ آدم کثیف
**little** /ˈlɪtl/ *adjective, adverb, noun*
1 چکۆلە، بچووک، ورد، بچیک، چکۆلانە: *a little* ◊ *a little group of tourists* ◊ *little house* ◊ *the classic little black dress* 2 (مەودا) کورت، کەم 3 کەم، *boy/girl* بەشنەکردوو، ناتەواو، نەزۆر، نە ئەوندە 4 ناگرنگ، هیچەکە، تایەخ، چکۆلانە 5 برێکی کەم، پشکێ، نەختێ، برێ، کەمێ 6 ماوەیەکی کەم 7 شتێ کەم ◌ 1 کوچک، کوچولو 2 کوتاه 3 مختصر، کم 4 بی‌اهمیت 5 ناچیز، مقدار کم 6 مدت کم 7 چیز کم
**little auk** *noun*
تۆکی چکۆلە (دەنووککورت، لە Arctic زاوزێ دەکا [*Alle alle*]) ◌ اوک کوچک
**little by little** *adverb*

بردنەوەی هەموو کایەکان جگە لە دانەیێ لە بریجدا bridge ◇ لیتل سلام

**little theatre** *noun*

تیاتری چکۆلانە (بۆ بینەرانێکی کەم و بلیتەکەشی کەمە) ◇ تئاتر کوچک

**littoral** /ˈlɪtərəl/ *adjective, noun*

*adj* کەناری، دەمئاو، زریاری، بەستێن *n* ناوچەی کەناری، ب.ت. نێوان بەرزترین و نزمترین ئاستی کێشاو tide ◇ *adj* ساحلی *n* نوار ساحلی

**lit up** *adjective*

مەستی مەست، کەلەلا ◇ پاتیل

**liturgical** /lɪˈtɜːdʒɪkl, US -ˈtɜːrdʒ-/ *adjective*

1 سەربە ڕێورەسم یان ئاهەنگی پەرستنی بە کۆ لە کلێسە، ئایینی، سەربە نەریت یان سروتی دینی 2 سەربە ئایین یان ڕێورەسمی نوێژ 3 سەربە نوێژ ◇ 1 عبادی 2 وابسته به مراسم نماز 3 وابسته به نماز

**liturgically** /-kli/ *adverb*

لەباری نەریتی (یان سروت) دینی(یەوە) ◇ از نظر عبادی

**liturgics** /lɪˈtəːdʒɪks/ *noun, pl.*, also liturgiology

لێکۆڵینەوەی سروتە دینییەکان، سروتەوانی ◇ لیتورژیولوژی

**liturgist** /ˈlɪtədʒɪst/ *noun*

لێکۆڵەری نەریت یان سروتە دینییەکان، سروتەوان ◇ لیتورژیست

**liturgy** /ˈlɪtədʒi, US ˈlɪtərdʒi/ *noun, pl.* liturgies

1 ڕێورەسم یان ئاهەنگی پەرستن (بە کۆ لە کلێسە)، ڕێورەسم یان ئایینی نوێژ، نەریت یان سروتی دینی 2 نوێژی شێوی خواوەندی ◇ 1 آیین عبادت کلیسایی 2 نماز عشاء ربانی

**Litvak** /ˈlɪtvak/ *noun*

لیتڤەک، لیتڤاک (جوولەکەیێ لە ناوچەی لیتوانیا) ◇ لیتواک

**livable** = liveable

**live** /laɪv/ *adjective, adverb*

*adj* 1 زیندوو، زیندە، زندی، لە سەرێنیدا 2 گڕگرتوو، هەڵبوو، سوورەوەبوو، دەسووتێ، داگیرساو 3 بەتین، بەتاو، بەگوڕ، بەکەیف 4 سەرنجڕاکێش، گەرم 5 ئامادە بۆ بەکارهێنان، دەسلێنەدراو، بەکارنەهێنراو، مۆر، تازە، کۆنەنەبوو 6 لەتەقینەوەهاتوو، شەڕی، ڕاستی، جەنگی، دەتەقێتەوە 7 (وایەر) کارەبای تیایە، کارەباتیابوو 8 (بەرنامە) زیندوو، زندی، ڕاستەوخۆ 9 (موسیقا) بەدرێژایی کۆنسێرت، نە لە ستۆدیۆ 10 (ماست) سەربە هەوێن، سەربە ئامیان یان مایە *adv* زیندوو، بە شێوەیەکی

کەمکەم، بەرەبەرە، وردەوردە ◇ کم‌کم

**Little Bear** *noun*, also Ursa Minor

(ئەستێرەوانی) ورچی چکۆلە ◇ دب اصغر

**Little Dipper** *noun*

حەوتەمین ئەستێرەی سەرەکی لە Usra Minor دا ◇ لیتل دیپر

**little finger** *noun*

قامکەتیتە، قامکەتووتە، زەرنەقووتە، زەرنەتووتە، میت، بابلیچک، کلیچک ◇ انگشت کوچک

**little folk** = little people

**little grebe** *noun*

grebe ی چکۆلە [*Tachybaptus ruficollis*] ◇ مرغ غواص کوچک

**little green man** *noun*

پیاوەسەوزیلە، (مرۆی) کورتەبنەی سەوز ◇ آدم سبز کوچک

**Little Hours** *noun, pl.*

نوێژی سەعاتی سێ، شەش و نۆ (کلێسەی رۆژاوا) ◇ لیتل هورز

**Little Ice Age** *noun*

سەردەمی سەهۆڵبەندانی چکۆلە یان بچوک (لە سەدەکانی حەڤدە و هەژدەدا ڕوویدا) ◇ عصر یخبندان کوچک

**little leaf** *noun*

گەلاگچکە: جۆرێ نەخۆشی ڕووەک کە لەودا گەلاکان چکۆلە، ڕەنگاوڕەنگ دەبن و باهەڵدەخۆن ◇ لیتل لیف

**Little League** *noun*

(لە ئەمریکا) لیگی بەیسبۆڵ بۆ منالان ◇ لیتل لیگ

**little man** *noun*

کەسێکی ئاسایی ◇ فرد عادی

**littleneck** *noun*, also littleneck clam

quahog ی چکۆلە کە دەکرێ بە کاڵی بخورێ ◇ لیتل نک

**littleness** /ˈlɪtlnəs/ *noun*

چکۆلەیی، بچووکی، کەمی، ناتەواوی ◇ کوچکی، ناچیزی، کمی

**little ones** *noun, pl.*

منالانی گەورە یان لاو ◇ بچه‌های جوان

**Little Office** *noun*

نوێژی تایبەتی مریەمە (کورتتر لە Divine Office) ◇ لیتل آفیس

**little owl** *noun*

(باڵندەناسی) کوندەی چکۆلە، کوندەگچکە (ڕەسەنی ئوراسیا و ئەفریکا) [*Athene noctua*] ◇ جغد کوچک

**little people** *noun, pl.*

1 خەڵکی ئاسایی 2 جنۆکە و پەری ◇ 1 مردم عادی 2 جن و پری

**Little Russian** = Ukranian

**little slam** *noun*

راستەوخۆ ◌ *adj* 1 زندە 2 مشتعل، افروختە 3 پرشور 4 جالب 5 آمادە برای استفادە 6 قابل انفجار 7 برق‌دار 8 مستقیم 9 لایو 10 وابستە بە مایە *adv* بە طور مستقیم

**liveability** /ˌlɪvəˈbɪləti/ *noun*
ژیانلێکراوی، لەنیشتەجێ‌هاتوویی، لەدانیشتن‌هاتوویی ◌ قابلیت سکونت

**liveable** /ˈlɪvəbl/ *adjective*, US also livable
1 ژیانلێکراو، لەنیشتەجێ‌هاتوو، جێی‌ژیوار، شیاوی لێ‌مانەوە، لەدانیشتن‌هاتوو، ژیانی لێ‌دەکرێ، بۆ دانیشتن دەبێ، بۆ گیرسانەوە دەبێ، باش یان لەبار (بۆ ژیان)، ژیانی پێ‌دەکرێ: *-ble a -le house ◊ wages* 2 دەتوانی تێیدا هەڵکەی، دەردەبەی ◌ 1 قابل سکونت 2 قابل تحمل

**live action** *noun*
ڕووداو یان ئەکشنی زیندوو (لەچاو کامپیوتێری) ◌ اکشن زندە

**live-birth** *noun*
زیندەبوو، زیندەزا، منالی بە زیندوویی (لە دایک)بوو ◌ زندەزاد

**live-bearer** *noun*
گیانەوەری زیندەزا یان زیندەزێ ◌ جانور زندەزا

**live-bearing** *adjective*
زیندەزا، زیندەزێ، بێچووخەر = viviparous ◌ زندەزا

**live-in** /ˈlɪv ɪn/ *adjective*
پێکەوەژیاو (بەلام نە بە شێوەی ژن‌ومێردایەتی): ◌ *a live-in partner ◊ a live-in maid* دارای زندگی مشترک

**livelihood** /ˈlaɪvlihʊd/ *noun*
ژیوار، گوزەران، دەرامەت، بەڕێ‌چوون، ئەنوا، هۆی گوزەران یان ژیوار، مایەی ژیوار یان بەڕێ‌چوون ◌ معیشت، امرار معاش، وسیلەی معاش

**livelong**[1] /ˈlɪvlɒŋ, US -lɔːŋ/ *adjective*
تەواوی، هەمووی، بە درێژایی ◌ تمام

**livelong**[2] /ˈlɪvlɒŋ, US -lɔːŋ/ *noun*
stonecrop، ب.ت. orpine ◌ لایولانگ

**lively** /ˈlaɪvli/ *adjective* (livelier, liveliest)
1 بەتین، بەگوڕ، بەپەرۆش، خۆشحاڵ، بەکەیف، لەجۆش، دڵتەڕ، پەدەماغ، بەنەشە، چاپک، چوست، چالاک، گورج‌وگۆڵ، بەجم‌وجۆڵ 2 (ڕەنگ) ڕۆشن، گەش، شاد *livelily adv*: بەکەیفانە، بە خۆشحاڵی؛ *liveliness n*: خۆشحاڵی، بەکەیفی، گورج‌وگۆڵی، توندوتۆڵی، چاپکی، تین‌وگوڕ) ◌ 1 پرشور، بانشاط، سرزندە، چابک، فعال، پرتحرک 2 (رنگ) روشن

**live oak** *noun*
(ڕووەک‌ناسی) جۆرێ بەڕووی هەمیشەسەوزی ئەمریکای باکووری [*Quercus virginiana*] ◌ نوعی بلوط

**liver**[1] /ˈlɪvə(r)/ *noun*
جەرگ، جگەر (چ وەک ئەندامی یان شتی خۆراکی) ◌ کبد، جگر

**liver**[2] /ˈlɪvə(r)/ *noun*
مرۆ، بنیادەم: *a clean liver* ◌ آدم

**liver chestnut** *noun*
ئەسپی شێی ڕەش ◌ اسب کهر سیاەرنگ

**liveried** /ˈlɪvərid/ *adjective*
یونیفۆرم‌لەبەر(کردوو)، یونیفۆرم‌پۆشیو، یەک‌بەرگ‌لەبەرکردوو: *a liveried chauffeur* ◌ اونیفورم‌پوشیدە

**liverish** /ˈlɪvərɪʃ/ *adjective*
1 تووش‌بوو بە نەخۆشی (تێکچوونی) جگەر 2 ڕووتاڵ، بەدخولک، خوێن‌تاڵ (*liverishness n*) ◌ 1 دچار اختلال کبد 2 عبوس، بدعنق

**Liverpudlian** /ˌlɪvəˈpʌdliən/ *noun, adjective*
*n* 1 خەڵکی لیڤێرپوول، لیڤێرپوولی 2 زاراوە یان شێوەزاری لیڤێرپوولی *adj* سەربە لیڤێرپوول ◌ لیورپولی

**liver sausage** *noun*, also liverwurst
سۆسیجی جەرگ یان جگەر ◌ سوسیج جگر

**liverwort** /ˈlɪvəwɜːt/ *noun*
(ڕووەک‌ناسی) پەلەکەرگ، فرەپێ، قژی کەنیشک، باوەشێن [پۆل Hepaticae] ◌ بسفایج

**livery**[1] /ˈlɪvəri/ = liverish

**livery**[2] /ˈlɪvəri/ *noun, pl.* liveries
1 جلی نوکەری، یونیفۆرم (جلی نوکەرانی پێشوو)، یەکبەرگ 2 بەرگ 3 نیشانە، دروشم 4 دابینی خۆراک و جلی نوکەران 5 مەیتەر، تەویلەدار ◌ 1 اونیفورم 2 پوشش 3 علامت 4 لیوری 5 طویلەدار

**livery company** *noun*
(لەندەن) دەستەی پیشەیی هاوبەرگ یا یونیفۆرم‌دار ◌ صنف اونیفورم‌دار

**liveryman** /ˈlɪvərimən/ *noun, pl.* liverymen
1 ئەندامی دەستەی پیشەیی هاوبەرگ یان یونیفۆرم‌دار 2 کرێکاری تەویلەی گشتی، خانچی ◌ 1 عضو صنف اونیفورم‌دار 2 کارگر اصطبل

**livery stable** *noun*, also livery yard
تەویلەی گشتی، پشتێری گشتی (بۆ ڕاگرتنی ئەسپی خەڵک و جاروبار بە کرێ‌دانی) ◌ اصطبل عمومی

**lives** = plural form of life

**livestock** /ˈlaɪvstɒk, US -stɑːk/ *noun*
پاتاڵ، ئاژەڵ، دەولەت، مەڕ و ماڵات ◌ دام

**livewire** /ˈlaɪvweə(r), US -wer/ *noun*
1 وایەری کارەباتیابوو یان کارەبادار 2 مرۆ یان بنیادەمی گورج‌وگۆڵ ◌ 1 سیم برق‌دار 2 آدم پرجنب‌وجوش

**livid** /ˈlɪvɪd/ *adjective*

1 شینی ئامال‌بۆر 2 رق‌هەستاو، رەنگ‌بەریو، رەنگ‌بزرکاو، سپی‌بەوەبوو (lividly *adv*: بە تووڕەیی(یەوە)) ۞ 1 سربی 2 عصبانی، رنگ‌پریده

**lividity** /lɪˈvɪdɪtɪ/ *noun*, also lividness

1 شین‌بوونەوە، شینی، کەووبوون، خوێن‌تیزان 2 رق‌هەستاوی، سپی‌بوونەوە، رەنگ‌بەریوی، رەنگ‌بزرکاوی ۞ 1 کبودی 2 عصبانیت، رنگ‌پریدگی

**living** /ˈlɪvɪŋ/ *adjective, noun*

*adj* 1 زیندوو، ژین‌دار: ◊ *living organisms* 2 (ئاو) رەوان 3 *the finest living pianist* سەخت، ناخۆش، گران، بەهێز، بەقەوەت 4 بەکەیف، بەگوڕ، بەدەماخ *n* 1 ژیان، ژین، ژیوار، گوزەران، رزق و رۆزی، بەڕێ‌چوون 2 داهات، دەرامەت: *to make a good/decent/meagre living* 3 پلەوپایە یان داهاتی سەرقەشە 4 ( the living) زیندووان، کەسانێ کە لە سەرێتی دان ۞ *adj* 1 زنده 2 جاری 3 شدید، قوی 4 سرزنده *n* 1 زندگی، معیشت 2 درآمد 3 مقام یا درآمد اسقف 4 (the living) زندگان

**living death** *noun*

ژیانی بەکجار ناخۆش، سەگ‌مەرگی، کوڵەمەرگی ۞ مرگ تدریجی

**living fossil** *noun*

فوسیل یان (بە)بەردبووی زیندوو (رووەک یان گیانەوەرێ کە هێشتا ماوە) ۞ سنگوارەی زنده

**living language** *noun*

زمانی زیندوو ۞ زبان زنده

**living rock** *noun*

بەردی زیندوو (ئێستاش بەشێ لە زەوی پێکدێنێ) ۞ صخرەی زنده

**living room** *noun*

ژوور یان دیوی نیشتمان، دیوی (تیا)دانیشتن ۞ اتاق نشیمن

**living space** *noun*

مەڵبەند یا بواری ژیان (تیاکردن) ۞ فضای حیاتی

**living stones** *noun, pl.* same, also called lithops, stone plant

زیندەبەردان: هەریەک لەو چەندین جۆری رووەکە گۆشتەکان succulent، رەسەنی ئەفریکا، بە گوڵی زەرد و سپی و گەڵای ئەستوورەوە کە شێوەی بەرد دەدەن [تۆخم *Lithops*] ۞ لایوینگ استونز

**living standard** *noun*

ئاستی ژیان ۞ سطح زندگی

**living wage** *noun*

مووچە یان مزی بەش‌کردوو، کەم‌ترین حەق یان مز، مووچەی نەمرنەژی، ژیوارانە ۞ حداقل دستمزد

**Livonian** /lɪˈvəʊnɪən/ *adjective, noun*

*adj* سەربە لیڤۆنیا، لیڤۆنیایی *n* دانیشتووی رەسەنی لیڤونیا، ناوچەیێ لە رۆژهەڵاتی کەناری دەریای باڵتیک ۞ لیونیایی

**lixiviation** /lɪksɪvɪeɪʃn/ *noun*

1 شواردن، شتن، شۆردن 2 پاڵاوتن، پارزنین ۞ 1 شستشو 2 تصفیه

**lizard** /ˈlɪzəd, US -ərd/ *noun*

مارمێلک، بیکمار، بزنمژ، تیرتیرە، تێرتیرە، فاتفاتک، خەمەگرۆ، مەزووکە، گومگمۆک [ژێردەستە Lacertilia: زۆر جۆری هەیە] ۞ مارمولک، سوسمار

**lizard orchid** *noun*

گیاسارمەی مارمێلکی [ *Himantoglossum hircinum*] ۞ نوعی ثعلب

**lk** *abbreviation* the Gospel of Luke

**ll** *abbreviation* lines

**llama** /ˈlɑːmə/ *noun*

وشترە بێ‌کۆپارە (ئەمریکای باشووری [ *Lama glama*]) ۞ لاما

**llanero** /laˈnɛːrəʊ, US lj-/ *noun, pl.* llaneros

(لە ئەمریکای باشووری‌دا) دانیشتووی llano ب.ت. یەکێ کە کارەکەی وەک گاوانی وابێ ۞ لانرو

**llano** /ˈlɑːnəʊ, US ˈljɑː-/ *noun, pl.* llanos

مێرگەڵان (ئەمریکای باشووری، دەشتێکی سەوزی بێ‌دار؛ بنەڕەت: لە *planum* لاتین "plain") ۞ لاما

**LLB** *abbreviation* Bachelor of Laws

1 بەکالیۆر لە مافدا 2 بڕوانامەی بەکالیۆر لە مافدا (لە *legum baccalaureus* لاتین) ۞ 1 کارشناس حقوق 2 درجەی کارشناسی حقوق

**LLD** *abbreviation* Doctor of Laws

1 دوکتۆر لە مافدا 2 بڕوانامەی دوکتۆری لە مافدا (بنەڕەت: لە *legum doctor* لاتین) ۞ 1 دکتر حقوق 2 درجەی دکتری حقوق

**LLM** *abbreviation* Master of Laws

1 ماستێر لە مافدا 2 بڕوانامەی ماستێر لە مافدا (لە *legum magister* لاتین) ۞ 1 کارشناس ارشد حقوق 2 درجەی کارشناسی ارشد حقوق

**Lloyd's** /lɔɪdz/ *noun*

1 (لەندەن) بیمەی لۆیدز، لە 1871 لە ئینگلتەرە دامەزرا 2 کورتەی Lloyd's Register ۞ بیمەی لویدز

**Lloyd's Register** *noun*, in full Lloyd's Register of Shipping

1 تۆمار(نامە)ی لۆیدز بۆ کەشتی‌گیری: لیستێکی پۆلێنراوی کەشتی‌یە بازرگانی‌یەکان لەژوور تۆناژێکی دیاری‌کراودا، ساڵانە لە لەندەن بڵاو دەبووەوە 2 کۆمپانی بەرهەم‌هێنەری ئەم لیستە ۞ رجیستر لویدز

**lm** *abbreviation* lumen

**lo** /ləʊ, US loʊ/ *interjection, noun*
*interj* چاو، چاولێکە، بڕوانە، بنێرە، شا، ئەها، ها *interj* ◌ بە عەمری خودا (lo and behold) *n* بنگر *n* با کمال تعجب

**loa** /ˈləʊə/ *noun, pl.* same or loas
لۆئا (= خودایێ لە cult تیرەی ڤۆدۆی هائیتیدا) ◌ لوآ

**loach** /ləʊtʃ/ *noun*
جۆرێ ماسی سمێڵی ئاوە شیرینەکان [خێزانەکانی Homalopteridae و Cobitidae: گـەلـێ جۆرن] ◌ نوعی ماهی

**load** /ləʊd, US loʊd/ *noun*
1 بار، کۆڵبار، بارگە، کۆڵ، ئەو بڕەی کە دەتوانرێ هەڵبگیرێ 2 قورسایی، سەنگایی، ئەرک، گوشار، بەرپرسایەتی 3 بڕی ئەو کارەی کە لە لایەن کەس یان دەزگایێکەوە دەکرێ 4 بار یان بارگەی ئێلیکتریکی 5 (چەکوچۆڵ) لوود؛ دارگرتنەوە، پڕکردنەوە 6 ژمارەیەکی زۆر، دنیایێ، کۆڵێ، زۆر، لۆدە، کۆما، پێخوێ ◌ 1 بار، ظرفیت 2 فشار، مسؤلیت 3 لود 4 بار الکتریکی 5 (اسلحه) خرج؛ عمل پرکردن 6 تعداد زیاد، زیاد، یک عالم

**loaded** /ˈləʊdɪd, US ˈloʊd-/ *adjective*
1 بارکراو، بارلێنراو، ئاخنراو، داگیراو، پڕ، تژی 2 پارەدار، دەوڵەمەند، پڕسامان 3 واتادار، ناودار، مانادار، زیاتر لە یەک واتا 4 (ئەمریکای باکووری) مەست، کەلەلا ◌ 1 بارشده، پر 2 پول‌دار 3 معنی‌دار 4 مست

**loaded question** *noun*
پرسیاری لەداوخستن (یان لەداوخەرانە) ◌ سؤال انحرافی

**loader** *noun*
بارلێنەر، بارکەر ◌ بارگذاری‌کننده، بارکننده

**load factor** *noun*
(هاو)کۆلکە یان فاکتۆری بار ◌ ضریب بار

**loading** /ˈləʊdɪŋ, US ˈloʊd-/ *noun*
بارلێنان، بارکردن، باربەندی، (داگرتن) ◌ بارگیری

**load line** = Plimsol line

**loadmaster** *noun*
بەرپرسی بار (ئەندامی کارکەرانی فڕۆکەیێ)، بارەوان ◌ متصدی محموله

**loadstar** = lodestar

**loadstone** = lodestone

**loaf** /ləʊf, US loʊf/ *noun, pl.* loaves
کولێرە، ستورک، ئەستورکە، لوێشک، دۆڕک، سەموون، پاتۆل: *Two ◊ a loaf of bread ◊ a sliced loaf ◊ white loaves, please* (بنەڕەت: *hlāf* ئینگلیسی کۆن، ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ گرده نان، قرص نان

**loafer** /ˈləʊfə(r), US ˈloʊf-/ *noun*
1 کەسێکی لەش‌گران، کارنەتوان، کارنەکەر، هیچ‌لەدەس‌نەهاتوو، مرۆی تەوەزەل و تەمەڵ، بەرەڵا، گەڕاڵ 2 پێلاو یان کەوشی تەخت ◌ 1 آدم تنبل، ولگرد 2 کفش راحتی

**loaf sugar** *noun*
قەنی کولۆ(یی) ◌ قند حبه

**loam** /ləʊm, US loʊm/ *noun*
1 لوم (= گڵێ کە زیخ، گژوگیا و هتد تیایێ) 2 قوڕی شێلراو یا خۆش‌کراو (*n* loaminess؛ *adj* loamy) ◌ لوم

**loan**[1] /ləʊn, US loʊn/ *noun*
1 قەرز، دەسی، واو، وام، قەرزکردن 2 وەرگرتن، قەرزکردن 3 (کورتەی) loanword = (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ 1 قرض، وام، استقراض 2 اقتباس

**loan**[2] *noun,* also loaning
1 (سکاتلەندی) lane = 2 پەچەی دۆشینی گاگەل ◌ لون

**loan bank** *noun*
بانکی (پارە) بە قەرزدان ◌ بانک استقراضی

**loan-collection** *noun*
کۆمەڵەیەکی بەقەرز(وەر)گیراو (چەندین کاری هونەری بۆ پیشانگا) ◌ مجموعەی قرضی

**loanee** *noun*
قەرز(وەر)گر ◌ وام‌گیرنده

**loanholder** /ˈləʊn həʊldə(r)/ *noun*
بارمتەگر ◌ رهن‌گیر

**loan shark** *noun*
سوودخۆر، سووت‌خۆر (بە سوودیکی زۆرەوە و هەڕەشەش بۆ دانەوە) ◌ نزول‌خور

**loan sharking** *noun*
سوودخۆری، سووت‌خۆری ◌ نزول‌خوری

**loan translation** *noun*
وەرگێڕانی قەرزی ◌ ترجمەی قرضی

**loanword** /ˈləʊnwɜːd, US ˈloʊnwɜːrd/ *noun*
وشەی خوازراو، قەرزەوشە، وشەی وەرگیراو ◌ واژەی قرضی

**loath** /ləʊθ, US loʊθ/ *adjective,* also loth
ناقایل، نارازی، پێخۆش‌نەبوو، بێزار، reluctant ◌ نامتمایل، ناراضی

**loathful** *adjective,* also loathsome
بێزاوی، بێزەوون ◌ نفرت‌انگیز

**loathing** /ˈləʊðɪŋ, US ˈloʊð-/ *noun*
بێزاری، قێن‌لێبوون، ناقایلی، بێزلێ‌کردنەوە، پێخۆش‌نەبوون: *Many soldiers returned with a deep loathing of war* ◌ تنفر، انزجار

**loathsome** /ˈləʊðsəm, US ˈloʊð-/ *adjective*
بێزاوی، گەن، بێزەوون، قێزەوون، ناخۆش، repulsive ،disgusting ◌ نفرت‌انگیز

**loathsomely** /ˈləʊðsəmli, US ˈloʊð-/ *adverb*

بێزاویانە، بێزەونانە، قێزەونانە ◌ بـە طـور نفرت‌انگیز

**loathsomeness** /'ləʊðsəmnəs, US 'loʊð-/ *noun*

بێزەونی، گـەنی، بێزاوی‌بـوون، قێزەونی ◌ نفرت‌انگیزی

**loaves** = plural form of loaf

**lob** /lɒb, US lɑ:b/ *noun*

(کریکێت و تێنیس) تۆپی تووڕهەڵدراو، لێدانی تۆپێ کە بە شێوەی کەوانەیی و بەرز بێ: *to play a lob* ◌ توپ کشیده

**lobar** /'ləʊbə/ *adjective*

(تویکاری و پزشکی) پلی (ب.ت. پلی سی) ◌ لوبار

**lobate** /'ləʊbeɪt/ *adjective*

پل‌پل، پلاوی، خاوەن‌پل ◌ دارای لب، فص‌فص

**lobation** /'lɒ'beɪʃn/ *noun*

بوونەپل‌پل، پەرەپەرە، پلاوی‌بوون ◌ دارای لب، فص‌فص‌شدگی

**lobby** /'lɒbi, US 'lɑ:bi/ *noun, pl.* lobbies

1 دالان، هـەیوان، تـالار، هـاڵ یـان هۆڵـی چـاوەڕوانی، شـوێنێ لە پارلـەمانی بریتانیـا کـە خەڵـک دەتـوانن لەگـەڵ ئەنـدامانی پارلـەمان چاوپێکـەوتن سـاز بـدەن: *a hotel lobby* 2 دەستە یان کۆمەڵی سەنگی‌دانان، لابی، کۆمەڵـی دەس‌ڕۆیـشتوو: *The gun lobby is/are pressure against any change in the law group* ◌ 1 تالار ورودی 2 لابی، گروه فشار

**lobe** /ləʊb, US loʊb/ *noun*

1 نەرمەی گوێ، بەلک، شلکەی گوێ، چینچک، چیچیلە 2 پل، پەرە 3 بەش، تیکە، لەت، پارچە ◌ 1 نرمەی گوش 2 لب، قطعه، فص 3 قسمت

**lobectomy** *noun, pl.* lobectomies

پل‌دەرکێشی، هەڵکێشانی پل ◌ لب‌برداری

**lobed** *adjective*

پلاوی، پل‌پل، پەرەپەرە ◌ مفصص، فص‌فص

**lobelia** /lə'bi:lɪə/ *noun*

لوبێلیا: گیایێ لە تیرەی bellflower، زۆرتر بە گوڵـی شـین یـان سـووری گەشـەوە [تـوخم *Lobelia*: زۆر جۆری هەیە] ◌ نوعی گیاه

**lobeline** *noun*

جۆرێ ئالکالۆیدی کریستالی $C_{22}H_{27}NO_2$ لە تووتنی هێندی دەگیرێ، زۆرتر وەک هاندەرێکی هەناسەیی بەکاردێترێ ◌ لوبلین

**loblolly** = 1 loblolly pine 2 mire 3 lout

**loblolly pine** /'lɒblɒli/ *noun*

(رووەک‌ناسی) جۆرێ کاژ، ڕەسەنی باشووری رۆژهەلاتی ئەمریکا [*Pinus taeda*] ◌ نـوعی کاج

**lobo** /'ləʊbəʊ/ *noun, pl.* lobos = timber wolf

**lobotomy** /ləʊ'bɒtəmi, lə-, US loʊ'bɑ:t-/ *noun, pl.* lobotomies

پل‌بڕی (= بڕینی بەشێ لە مێشکی مرۆڤ بە مەبەستی چارەسەرکردنی نەخۆشی دەروونی) ◌ لب‌بری

**lobscouse** /'lɒbskaʊs/ *noun*

جۆرێ چێشتی جارانی مەلەوانان (لە گۆشت، سـەوزی و ship's biscuit پێکهـاتبوو) ◌ لوبسکوس

**lobster** /'lɒbstə(r), US 'lɑ:b-/ *noun*

1 قرژاڵ، کیفژاڵ [*Homarus* و توخمەکانی تر] 2 گۆشتی قرژاڵ 3 خۆراک یا چێشتی قرژاڵ ◌ 1 خرچنگ 2 گوشت خرچنگ 3 غذای خرچنگ

**lobster moth** *noun*

پەپوولە(شەوگەڕە)قرژاڵ(لە [*Stauropus fagi*]) ◌ نوعی پروانه

**lobster Newburg** /'nju:bə:g/ *noun*

جۆرێ چێشتی قرژاڵ ◌ نوعی غذای خرچنگ

**lobster-pot** *noun*

تۆڕی ڕاوەقرژاڵ، سەبەتەی ڕاوەقرژاڵ ◌ تـور صید خرچنگ

**lobster thermidor** /'θɜ:mɪdɔ:/ *noun*

جۆرێ چێشتی قرژاڵ ◌ نوعی غذای خرچنگ

**lobulate** /-lət/ *adjective,* also lobulated

پلۆچکـەدار، خـاوەنی پـەڕەی پچـوک ◌ دارای لب کوچک

**lobule** /'lɒbju:l/ *noun*

پلۆچکە، پلۆکە، پەڕەی پچوک (*adj* lobular: سەربە lobule، پل‌ئاسا، پلی، پەرەیی، شێوەپل) ◌ لب کوچک

**lobworm** /'lɒbwɜ:m/ *noun*

جۆرێ کرمی گلی چەشتەی ماسی ◌ نوعی کرم

**lo-cal** /ˌləʊ 'kæl, US ˌloʊ/ *noun*

لۆکاڵ (چێشت یان خواردنەوەی بێ‌کالۆری) ◌ لوکال

**local** /'ləʊkl, US 'loʊkl/ *adjective, noun*

*adj* 1 خـۆجێیی، لاخـۆیی، خـۆلایی، ناوچـەیی، خۆماڵی: *a local farmer* 2 (پزشـکی) شوێنی، *n* topical 1 خەڵـکی گـەرەک 2 مـەیفرۆشی گـەرەک 3 لقێ لـە یـەکێتی کرێکـاری (یـان کرێکاران) 4 شـەمەندەفەر یـان پاسـی خـۆجێیی یان گەرەک ◌ *adj* 1 محلی 2 (پزشکی) موضعی *n* 1 اهالی محل 2 مشروب‌فروشی محل 3 لوکال 4 قطار یا اتوبوس محلی

**local anaesthetic** *noun*

سـڕکەری شـوێنی (بەشـێ لــە لــەش) ◌ بی‌حس‌کنندەی موضعی

**local area network** = LAN

**local authority** *noun*

بەرپرسان یان کاربەدەستانی حکومەتی خۆجێیی ◌ مسؤلان یا مقامات دولت محلی

**local call** *noun*

تەلەفونی ناوچەیی ◌ تلفن منطقه‌ای
**local colour** *noun*
ڕەنگ‌وبۆی ناوچەیی یا خۆجێیی ◌ صبغه‌ی محلی
**local council** *noun*
ئەنجومەنی خۆجێیی یا ناوچەیی ◌ شورای محلی
**local derby** *noun*, also Derby1
پێشبڕکێی تۆپی‌پێی ناوچەیی یان خۆجێیی ◌ مسابقه‌ی فوتبال محلی
**locale** /ləʊ'kɑːl, US loʊ'kæl/ *noun*
شوێنی ڕوودان، ڕوودانگە: *the employment structure of the two locales* scene، site: *the locale of a story* ◌ محل وقوع
**local government** *noun*
حکومەتی خۆجێیی یا ناوچەیی ◌ دولت محلی
**local history** *noun*
مێژووی خۆجێیی یان ناوچەیی ◌ تاریخ محلی
**localism** /'ləʊkəlɪzəm/ *noun*
زاراوە یان دەستەوشەی خۆجێیی، داب‌ونەریتی خۆجێیی، لایەن یان ڕەنگی خۆجێیی، دەمارگرژی، بەرتەسکی بیرکردنەوە، ناوچەگەری ◌ اصطلاح محلی، آداب و رسوم یا جنبه‌ی محلی، منطقه‌گرایی، تعصب
**locality** /ləʊ'kæləti, US loʊ-/ *noun, pl.* localities
1 شوێن، جێگا، حەن، جێ، دەروبەر، جێ یان شوێنی تایبەتی، شوێنی جوگرافیایی 2 شوێنی ڕوودان 3 ناوچە، دەڤەر، شوێن ◌ 1 محل، محل خاص 2 محل وقوع 3 محله، منطقه، موضع
**localization** /ˌləʊkəlaɪ'zeɪʃn, US ˌloʊkələ'z-/ *noun*
1 خۆجێیی‌کردن، ناوچەیی‌کردن 2 سنووردارکردن، دیاری‌کردن، بەرتەسک‌کردنەوە، بەرتەنگ‌کردنەوە ◌ 1 محلی‌سازی 2 محدودسازی
**localized** /'ləʊkəlaɪzd/ *adjective*
1 خۆجێیی، ناوچەیی 2 شوێنی: *a localized infection* ◌ 1 محلی، منطقه‌ای 2 موضعی
**locally** /-kəli/ *adverb*
بە شێوەیێکی ناوچەیی یا خۆجێیی، ناوچەیی‌یانە، بە شێوەی شوێنی: *Do you live locally* ◊ to *work locally* ◌ به طور منطقه‌ای یا موضعی
**local option** *noun*
(ب.ت. لە سکاتلەند، نیوزیلەند و ئەمریکا) مافی هەڵبژاردن یا سەرپشکی خۆجێیی (بۆ فرۆشتنی خواردنەوەی ئەلکولی) ◌ حق انتخاب محلی
**local paper** *noun*
ڕۆژنامەی خۆجێیی ◌ روزنامه‌ی محلی
**local radio** *noun*
ڕادیۆی خۆجێیی ◌ رادیوی محلی
**local rag** *noun*
(نافەرمی) ڕۆژنامەی خۆجێیی یان ناوچەیی ◌ روزنامه‌ی محلی
**local time** *noun*
کاتی خۆجێیی، وەختی ناوچەیی یان خۆجێیی ◌ وقت محلی
**located** /ləʊ'keɪtɪd, US 'loʊkeɪ-/ *adjective*
هەڵکەوتوو، جێگرتوو ◌ واقع، قرارگرفته
**location** /ləʊ'keɪʃn, US loʊ-/ *noun*
1 شوێن، جێگا، هەڵکەوت، هەڵکەوتن 2 شوێنی فیلم(لێ)هەڵگرتنەوە (*adj* locational: سەربە location) ◌ 1 محل، جا، موقعیت 2 لوکیشن
**locative** /'lɒkətɪv, US 'lɑːk-/ *adjective, noun*
*adj* (ڕێزمان) شوێنی، شوێن‌دەربڕ *n* نێوی شوێن، ناوی جێگا (بڕوانە dative، accusative، genitive، nominative و vocative) ◌ *adj* مکانی *n* اسم مکان
**loc. cit.** /ˌlɒk 'sɪt, US ˌlɑːk/ *adverb, abbreviation* Latin *loco citato*
لە هەمان دەستەوشەدا، لە شوێنی باس‌کراودا ◌ همان‌جا، در محل ذکرشده
**loch** /lɒk, lɒx, US lɑːk, lɑːx/ *noun*
1 (سکاتلەند) گۆماو، گۆم، دەریاچە 2 کەنداوی باریک (لە گەیلی سکاتلەندی‌یەوە وەرگیراوە) ◌ 1 دریاچه 2 لوچ
**lochan** /'lɒk(ə)n, US 'lɒx(ə)n/ *noun*
(سکاتلەند) گۆماو، گۆمچە، دەریاچەی بچووک (لە گەیلی سکاتلەندی‌یەوە، چکۆلێنراوی *loch*) ◌ دریاچه کوچک
**lochia** /'lɒkɪə, US 'ləʊ-/ *noun*
(پزشکی) چڵک و کێمی ئاسایی منداڵدان پاش لێبوونەوە ◌ نفاس
**lochial** *adjective*
سەربە lochia ◌ وابسته به نفاس
**loci** = plural form of locus
**loci classici** = plural form of locus classicus
**lock**[1] /lɒk, US lɑːk/ *noun*
1 قوفڵ، کیلوون، گاڵە، کلۆم 2 قوفڵی گیلەنگێدەن، زامن 3 گیران، گیراوی، گیرکردوویی، گیر، قوفڵ‌کردوویی، تێک‌ئاڵان 4 میکانیزمی تەقاندنی تەقەک یان خەرجی تفەنگ، چەخماخی تفەنگ 5 ئاوبەست، ئاوبەند 6 هەڵپێکان، قوفڵ (لە وەرزشە شەڕی‌یەکاندا) 7 (ڕاگبی) یاریزانی لە ریزی دووەمی هێرش‌دا 8 بەنداوی ئاوبەست‌دار بۆ بردنەسەرەوە یان بردنەخوارەوەی کەشتی و گەمی‌یەکان، کاتی پەڕینەوەی لە ئاستێکەوە بۆ ئاستێکی تر 9 لێک‌گیران، تێک‌گیری، لێک‌قوفڵ‌بوون، تێک‌گیران، قوفڵ‌بوون (ئەڵمانی بەرەوت) ◌ 1 قفل 2 قفل کلنگدن 3 گرفتگی 4 لوک 5 آب‌بند 6 قفل 7 و 8 لوک 9 درهم‌گیرکردگی
**lock**[2] /lɒk, US lɑːk/ *noun*

پەلکە، (locks) کـەزی، گیـسوو، تووکەسـەر، ئەگریجە، کاکۆڵ، پرچ، قژ، موو، زلف، (لۆکە و خوری) چنگ، لیسپ، تۆپەڵ، چەپک، تۆپ ۞ طره، (در جمع) موها، (پنبه و پشم) دسته

**lockable** /'lɒkəbl, US 'lɑ:k-/ *adjective*
قوفلی، شیاوی گالەدان، گالە دەدرێ، قوفل دەکرێ، شیاوی قوفڵکردن، قوفڵکراو ۞ قفل‌شدنی

**lockage** /'lɒkɪdʒ/ *noun*
1 تێپەڕانە، حەقی تێپەڕینی کەشتی 2 بڕی هەڵکشان و داکشانی ئاستی ئاو لە ئەنجامی بەکارهێنانی ئاوبەستەوە ۞ لاکیج

**locker** /'lɒkə(r), US 'lɑ:k-/ *noun*
1 دۆلاب (چکۆلە)، دۆلابچە، قەفەسە 2 سنووق یان دۆلابێ لەسەر کەشتی یان گەمی بۆ جلوبەرگ، تەقەمەنی و هتد 3 ئامێر یا ئامرازێ بۆ قوفڵکردنی شتێ ۞ 1 قفسه 2 و 3 لاکر

**locker-room** *noun*
(وەرزشگا) دیو یا ژووری خۆگۆڕین ۞ رخت‌کن

**locket** /'lɒkɪt, US 'lɑ:k-/ *noun*
1 گەردنبەند، (وەکوو گەردنبەند) قوتو، ملبەند 2 تەختەئاسن یان باریکەیێ لەسەر کالان ۞ 1 گردن‌بند 2 لاکت

**lockfast** /'lɒkfɑ:st/ *noun*
(سکاتلەندی) قوفڵکراو، گالەدراو ۞ قفل‌شده

**lockforward** *noun*
(ڕاگبی) یاریزانێ لە ریزی دووەمی هێرشدا ۞ لاک‌فوروارد

**lock-gate** *noun*
دەرچەی ئاوبەست ۞ دریچەی آب‌بند

**lockjaw** /'lɒkdʒɔ:, US 'lɑ:k-/ *noun*, also trismus
دەردەکۆیان، کلیلە، گوێرەپە، وشەیێکی تەکنیکییە بۆ trismus ۞ کزاز

**lock-keeper** *noun*
ئاوگرەوە ۞ متصدی آب‌بند

**lock-knit** *noun*
(پارچە) چنراوە بە تەقەلی لێکئالاوەوە ۞ لاک‌نیت

**lock-nut** *noun*
چەرەی قفل، مۆرەی پشتەوەگر یان پشبەست ۞ مهرەی قفل

**lockout** /'lɒkaʊt, US 'lɑ:k-/ *noun*
(لە لایەن خاوەنکارەوە) داخستنی کارگە یا کارخانە ۞ تعطیل کارخانه

**locksmith** /'lɒksmɪθ, US 'lɑ:k-/ *noun*
قوفلساز، کلیلساز، کلیلگەر ۞ قفل‌ساز

**lock-step** /'lɒkstep, US 'lɑ:kstep / *noun*
1 سانی کەسانی پشتسەریەک: *The coffin was carried by six soldiers walking in lockstep* (خوازە): *Politicians and the media are marching in lockstep on this issue (= they agree)* 2 دۆخێ کە لەودا شتەکان پێکەوە (هاوکات) ڕوودەدەن یان دەگۆڕێن (لە یەک ئاست و ڕێژەدا): *a lockstep approach to teaching* ۞ لاک‌استپ

**lock-stitch** *noun*
تەقەلی زنجیری یان سادە، تەقەلی چەرخ(ی دروومان) ۞ بخیەی چرخ

**lock-up** /'lɒk ʌp/ *noun*
1 دەسبەسەرخانە، گرتووخانە، بەندیخانە، زیندان 2 داخستن، قفڵکردن، گالەدان، گرتن ۞ 1 بازداشت‌گاه، زندان 2 بستن

**loco**[1] /'ləʊkəʊ, US 'loʊkoʊ/ *adjective*
شێت، حەپە، پەخمە، گێل ۞ دیوانه، خل

**loco**[2] /'ləʊkəʊ, US 'loʊkoʊ/, *pl.* locos = locomotive

**locomotion** /ˌləʊkə'məʊʃn, US ˌloʊkə'moʊʃn/ *noun*
جێگۆڕکێ، جوولە، جوولان، بزاوت، بزووتن، لڤین ۞ حرکت

**locomotive** /ˌləʊkə'məʊtɪv, US ˌloʊkə'moʊ-/ *adjective, noun*
*adj* جوولەیی، بزاوتی، جوولێنەر، بزوێنەر، جوولۆک، گەڕۆک *n* لۆکۆمۆتیڤ ۞ *adj* حرکتی، محرکه، متحرک *n* لوکوموتیو

**locomotor** *adjective*
بزوێنەر، جوولێنەر، جوولەیی، بزاوتی، دەجوولێ، دەبزوێ، گەڕۆک، جوولۆک، جێگۆڕ ۞ حرکتی، متحرک

**locoweed** *noun*
گوێنی، گۆنی [تۆوخم *Astragalus* و *Oxytropis*] ۞ گون

**locular** *adjective*, also loculate or loculted
خانەدار، خانەوەر ۞ دارای سلول

**locule** /'lɒkju:l/ = loculus

**loculus** /'lɒkjʊləs/ *noun, pl.* loculi /-lʌɪ, -li:/
کون، کونیلە، خانە، شوێنچە، بۆشایی بچووک (بنەڕەت: لە لاتینەوە، "compartment") ۞ سوراخ، حفرەی کوچک

**locum** /'ləʊkəm, US 'loʊ-/ = locum tenens

**locum tenency** *noun*
جێگری ۞ جانشینی

**locum tenens** /ˌləʊkəm 'ti:nɛnz, US 'tɛn-/ *noun, pl.* locum tenentes /tɪ'nɛnti:z, US tɛ-/
(قەشە یان دوکتورێ) جێگر (کاتی) ۞ جانشین

**locus** /'ləʊkəs, US 'loʊ-/ *noun, pl.* loci /-sʌɪ, -kʌɪ, -ki:/
1 شوێن، جێ، جێگا، وار، ناوەند، چەق 2 (بیرکاری) شوێنی ئەندازەیی، ئەندازگە ۞ 1

شعبه 4 مجمع یا شعبه‌ی فراماسونها 5 محل (ملاقات) 6 لانه 7 لانه‌ی بیدستر
**lodgement** /ˈlɒdʒmənt/ *noun*
1 پێشکەش کردن، هێنانەگۆڕێ، هێنانەئارا، خستنەبەردەم، دانان 2 پێ سپاردن، ئەسپاردەدانان، سپاردنی پارە 3 بەڵخ، نیشتوو، گرتوو 4 جێگاپێدان، گیرساندنەوە، گیرسانەوە، ماڵ، خانوو، جێگا، پەنا، accommodations ◌ 1 lodging اقامه، طرح 2 ودیعه‌گذاری 3 جرم 4 منزل دادن، استقرار، خانه، منزل
**lodgepole pine** *noun*
دارکاژی لوولی (راست) چیاکانی رۆژاوای ئەمریکای باکووری [*Pinus contorta var. latifolia*] ◌ نوعی کاج
**lodger** /ˈlɒdʒə(r), US ˈlɑːdʒ-/ *noun*
کرێنشین، کرێچی ◌ مستأجر
**lodging** /ˈlɒdʒɪŋ, US ˈlɑːdʒ-/ *noun*
1 جێ، شوێن، کوێن، خانوو، ماڵ، دیوی بەکرێ 2 نیشتەجێبوون، گیرسانەوە ◌ 1 جا، خانه، اتاق کرایه‌ای 2 اقامت
**lodging-house** /ˈlɒdʒɪŋ haʊs/ *noun*
ماڵی بەکرێ (ب.ت. بۆ ماوەی حەوتوویێ) ◌ خانه‌ی اجاره‌ای
**lodicule** /ˈlɒdɪkjuːl/ *noun*
بەرۆژە، بەرچە: کۆمەڵە پووڵەکەیێکی بنکی توودانی ovary هێندێ گوڵی گیایی (بنەڕەت: لە لاتین، چکۆلێنراوی *lodicula* ‏*lodix* "rug") ◌ پوستک
**loess** /ˈləʊɪs, US ləs/ *noun*
(زەویناسی) گلەزەردە (لە زۆر ناوچەی ئاسیا، ئەورووپا و ئەمریکادا، وا باوەڕە کە زۆرینەی بەهۆی کاری باوە نیشتبێ) ◌ خاک زرد
**loessic** *adjective*, also loessial
سەربە گلەزەردە، پێوەندی بە گلەزەردەوە هەیە ◌ وابسته به خاک زرد
**loft** /lɒft, US lɔːft/ *noun*
1 ژووری ژێر یان میچی ماڵ(ەوە)، دیوی نزیک بە میچ، زوورە 2 دیوی سەر تەویلە 3 کادێن، کادان، کۆتان، جێتفاق 4 هالی یان هۆڵی کلێسە، سەکۆی کلێسە 5 ریزە قەفەسەی کۆترەکان، کۆترخان 6 قەف یان چەماوی سەری دارگۆڵف (بنەڕەت: ئینگلیسی کۆن، لە *lopt* نۆروێژی کۆن "هەوا، دیوی ژووروو"، ئەلمانی بنەڕەت) ◌ 1 اتاق زیر شیروانی 2 اتاق روی طویله 3 انبار علوفه 4 تالار کلیسا 5 کبوترخان 6 لوفت
**loftily** /-ɪli/ *adverb*
لووتبەرزانە، فیزنانە، لەخۆباییانە ◌ مغرورانه
**loftiness** /ˈlɒftinəs, US ˈlɔːftinəs/ *noun*
بەرزی، بڵندی، فیزنی، لووتبەرزی، لەخۆباییبوون ◌ رفعت، غرور، تکبر
**lofty** /ˈlɒfti, US ˈlɔːfti/ *adjective* (loftier,

مکان، محل، مرکز 2 مکان هندسی
**locus classicus** /ˌləʊkəs ˈklasɪkəs, ˌlɒkəs/ *pl.* loci classici /ˌləʊsʌɪ ˈklasɪsʌɪ, ˌlɒkiː ˈklasɪkiː/ *noun*
(لاتین) نموونەی دیار ◌ شاهد بارز
**locust** /ˈləʊkəst, US ˈloʊ-/ *noun*
1 کوللە، کولە، کولو، مەلیە، سوسک [*Locusta migratoria*] و جۆرەکانی تر 2 (هەروەها locust tree) خرنووک، داردەرزی (بنەڕەت: لە لاتین *locusta* "crustacean, locust") ◌ 1 ملخ 2 درخت اقاقیا
**locution** /ləˈkjuːʃn/ *noun*
1 شێوەی دەربڕین، شێوازی دەربڕین یان وتن، راوێژ، دەراو، شێوازی ئاخافتن یا دەربڕینی زارەکی، 2 phraseology (ب.ت. لە زمانەوانیدا) زاراوە، بێژە 3 دەستەوشە، لارستە، برگە 4 وتە، وشە ◌ 1 سبک بیان 2 اصطلاح 3 عبارت 4 سخن، کلمه
**locutionary** /ləˈkjuːʃənəri/ *adjective*
سەربە دەربڕین، دەربڕانە ◌ بیانی
**locutionary act** *noun*
کردەوەی دەربڕانە، کردەوەی زمانی ◌ کنش یا عمل بیانی، کنش زبانی
**locutionary meaning** *noun*
واتای زمانی یان دەربڕانە ◌ معنای زبانی یا گویا
**locutory** /ˈlɒkjətɔːri/ *noun*, *pl.* locutories
شوێن یان دیوی وتوویژ (خانەقای رەبەنەکان) ◌ اتاق گفت‌گو
**lode** /ləʊd, US loʊd/ *noun*
1 (کان) رەگە، کانەرەگ 2 سەرچاوەیێکی بێکۆتا یا لەبننەهاتوو یان زەبەند 3 (لە گفتوگۆی ئینگلیسیدا) waterway ◌ 1 رگه 2 ذخیره‌ی وافر
**loden** /ˈləʊd(ə)n/ *noun*
1 جۆرێ پارچەی ئەستووری لەخۆری بارانی 2 رەنگی سووری تۆخ کە زۆرتر کوتاڵ و پارچەی وای تیا سازدەکرێ ◌ لودن
**lodestar** /ˈləʊdstɑː(r), US ˈloʊd-/ *noun*
1 ئەستێرەی جەمسەر، ئەستێرەی رێنیشاندەر 2 (خوازە) رێنیشاندەر، سەرمەشق، نموونە ◌ 1 ستاره‌ی قطبی، ستاره‌ی راهنما 2 راهنما
**lodestone** /ˈləʊdstəʊn, US ˈloʊdstoʊn/ *noun*, also loadstone
ئاسنکێش، مەگناتیسی سروشتی ◌ آهن‌ربا
**lodge** /lɒdʒ, US lɑːdʒ/ *noun*
1 دیوی دەرگاوان یان دالاندار 2 قولیت، خانوچکە، چاوە، جێگا، ماڵ، مەزڵ، ماڵۆچکە 3 لق، لک 4 کۆبوونەوە یان کۆڕی فراماسۆنەکان، لقی فراماسۆنەکان 5 شوێن، جێگا (یەکتردیتن) 6 خانووی خۆماڵی سوورپێستانی ئەمریکا 7 کونی سەگاو ◌ 1 اتاق سرایدار 2 منزل، کلبه 3

loftiest)
1 بـــەرز، گەردنکـــەش، بـــڵند، بـــڵیند، سـەرلەئاسمان‌خـشاو: 2 *lofty mountains* گەورە، مەزن، پایەبەرز، بەرز 3 لووت‌بەرزانە، فیزنانە، لەخۆبایی‌یانە ◌ 1 رفیع، بلند 2 بزرگ، عالی 3 مغرورانه

**log**[1] /lɒg, US lɔ:g, lɑ:g/ *noun*
1 کۆلکەدار، کۆتەرە، کۆلک، گردە 2 مووره، ئەنجینە، ساورمە، قەڵاشکەری: *logs for the fire* ◌ 1 کنده 2 لوگ

**log**[2] /lɒg, US lɔ:g, lɑ:g/ *noun*
1 (فرۆکە یان کەشتی) سەفەرنامە، تۆماری سەفەر 2 (کەشتی) خێرایی‌پێو ◌ 1 گزارش سفر 2 سرعت‌سنج

**log**[3] /lɒg, US lɔ:g, lɑ:g/ *noun*, also logarithm

**-log(o, ue)**, US spelling of –logue *suffix*
پاشگر: وتە، قسە، بیر، هزر ◌ پسوند: سخن، فکر، اندیشه

**loganberry** /ˈləʊgənbəri, US ˈloʊgənberi/ *noun, pl.* loganberries
1 تـوودرک، تووتـرک 2 تووترک، دەوەنی توودرک [*Rubus loganobaccus*] (بنەڕەت: لە نـاوی بـیـۆری باخـەوانی horticulturalist ئەمریکایی *Logan* .berry + James H) ◌ 1 تمشک 2 بوتەی تمشک

**logarithm** /ˈlɒgərɪðəm, US ˈlɔ:g-, ˈlɑ:g-/ *adjective*
لۆگاریتم: *the logarithm of 100 to the base 10 is 2* ◌ لگاریتم

**logarithmic** /ˌlɒgəˈrɪðmɪk, US ˌlɔ:g-, ˌlɑ:g-/ *adjective*, also -mical
لۆگـاریتمی (*adv* logarithmically: لـەباری لۆگاریتمەوە) ◌ لوگاریتمی

**log-book** /ˈlɒgbʊk, US ˈlɔ:g-, ˈlɑ:g-/ *noun*
1 (ماشێن) پەڕاو یان دەفتەرچەی خاوەنداری، کارتی خاوەنداری، قەباڵە 2 تۆمار(نامە)یەکی فەرمی ڕووداوەکان بە درێژایی کەشتی ڕۆژانەی کەشتی یان فڕۆکە، ڕۆژنامەی ڕووداوی کەشتی یان فڕۆکە ◌ 1 دفترچەی مالکیت 2 روزنامەی دریاپیمایی

**log cabin** *noun*
کۆختەی لەدار، قۆلیتی کۆلکەیی ◌ کلبەی چوبی

**loge** /ləʊʒ/ *noun*
لـۆژ، سـەرهەیوان، جێـی تایبـەت (بنـەڕەت: لـە فەرەنسەوە) ◌ لژ

**-loger** = -logist

**logger** /ˈlɒgə(r), US ˈlɔ:g-, ˈlɑ:g-/ *noun*
داربڕ ◌ چوب‌بر

**loggerheads** /ˈlɒgəhed, US ˈlɔ:gər-, ˈlɑ:g-/ *noun*
1 کـەس یـان مـرۆی گـەوج 2 (هـەروەها loggedkead turtle) رەقە، کیسەڵی دەریایی [*Caretta caretta*] 3 میلی داغ، میلی ئاسن 4 (at loggerheads) شـەڕ، نـاکۆکی، کێشە، ململانـێ، شەڕوکێشە، لێک‌هەڵـبڕژان ◌ 1 آدم احمق 2 لاک‌پشت دریایی 3 داغ‌آهن 4 ستیز، جنگ و اختلاف

**loggia** /ˈləʊdʒə, ˈlɒdʒiə, US ˈloʊdʒə, ˈlɑ:dʒiə/ *noun*
هـەیوان (بێ‌بەدەنـە و کۆلـەکەدار و بـەمیچ) ◌ بالکانەی ستون‌دار

**logging** /ˈlɒgɪŋ, US ˈlɔ:g-, ˈlɑ:g-/ *noun*
(دارسـتان) بـڕینی دارەکـان، داربـڕی ◌ قطـع درختان

**logia** = plural form of logion

**logic** /ˈlɒdʒɪk, US ˈlɑ:dʒɪk/ *noun*
1 لۆژیک، ژیربێژی؛ بنەما فەرمی‌یەکانی لقێکی زانـــستی نـــەزەری knowledge (یـــان لێکۆڵینەوەیی)؛ شێوازێکی تایبەتی بەڵگەهێنانەوە argumentation پێـوەنـدی لـۆژیکی شـتەکـان (وادیارە ژیرانە بن)؛ توانایی لێکدانەوەی دروست 2 (کـامپیوتێر) لۆژیـک؛ سـوورگەی لـۆژیکی، خـودی خولگـە یـان سـوورگەکـان (بنـەڕەت: لـە یۆنـانی‌یـەوە "هونـەری بەڵگەهێنانەوە *logikē (tekhnē)* ("art) of reason) ◌ 1 منطـق؛ لوژیک 2 منطق، مدار منطقی

**-logic** = -logical

**logical** /ˈlɒdʒɪkl, US ˈlɑ:dʒ-/ *adjective*
لۆژیکی، بەپێی لۆژیک، لۆژیکانە، ژیربێژی‌یانە، بەڵگەهێنانەوە بە گوێرەی بنەماکانی لۆژیک: *a logical inference* ◊ *a logical thing to do in the circumstances* ◊ *Each of them having their own room was the logical solution* ◊ *a logical argument* ◊ *Computer programming needs someone with a logical mind* (logicalness *n*) ◌ منطقی

**-logical** = -ology

**logicality** /ˌlɒdʒɪˈkælɪti/ *noun*
لۆژیکی‌بوون، لۆژیکیتی ◌ منطقی بودن

**logically** /-kli/ *adverb*
بە شێوەیەکی لۆژیکی، لۆژیکانە: *to argue logically* ◌ به طور منطقی

**logical necessity** *noun*
پێویستبوونی لۆژیکی، پێویستایەتی لۆژیکی ◌ ضرورت منطقی

**logical positivism** *noun*, also logical empiricism
پۆزیتیڤیزمی لۆژیکی (بزووتنەوەیێکی فەلسەفی سەدەی بیستەم؛ logical positivist *n*) ◌ اثبات‌گرایی منطقی

**logician** /lə'dʒɪʃn/ *noun*
لۆژیک‌زان، ژیربێژ ۞ منطق‌دان
**logion** /'lɒgɪɒn, US 'ləʊ-/ *noun, pl.* logia /-gɪə/
وتە و فەرموودە (پاڵدراوە بە کریستەوە، ب.ت. ئەوەی کە تۆمار نەکراوە، لە یونانی‌یەوە بە واتای "oracle") ۞ اقوال و گفتار
**-logist** = -ology
**logistic** /lə'dʒɪstɪk/ *noun,* also logistical /lə'dʒɪstɪkl/
1 سەربە ئەرتەش‌گێڕی، سەربە لەشکرگێڕی، لەشکرگێڕی‌یانە 2 سەربە ڕێکخستن، ڕێکخەرانە ۞ 1 تدارکاتی 2 وابسته به سازماندهی
**logistically** /-kli/ *adverb*
لەباری ئەرتەش‌گێڕی(یەوە) یان لەشکرگێڕی(یەوە) ۞ از لحاظ تدارکاتی
**logistics** /lə'dʒɪstɪks/ *noun, pl.*
1 ئەرتەش‌گێڕی، لەشکرگێڕی 2 ڕێکخستن ۞ 1 تدارکات 2 سازماندهی
**logjam** /'lɒgdʒæm, US 'lɔːg-, 'lɑːg-/ *noun*
1 بن‌بەست، بێ‌سەرەدەر 2 پێوەبوون، کەوتنەگیر، تووش‌بوون، گیرکردن 3 کۆڵکە سواراوەکان ۞ 1 بن‌بست 2 گرفتاری 3 کنده‌های شناور
**logo** /'ləʊgəʊ, US 'loʊgoʊ/ *noun, pl.* logos
دروشم، لۆگۆ، نیشانە، درف، هێما (بنەڕەت: کورتەی logogram و logotype) ۞ آرم، لوگو، شعار، رمز
**LOGO** *noun*
لۆگۆ (جۆرێ زمانی بەرنامەنووسی ئاسان) ۞ لوگو
**logoff** /'lɒgɒf, 'lɔːgɔːf, US 'lɑːg-: -ɑːf/ *noun*
(کامپیوتێر) لاگ‌ئاف، لاگاف، نیمچەکوژاندنەوە ۞ لاگ‌آف
**logogram** /'lɒgəgræm, US 'lɔːg-/ *noun*
لۆگۆگرام، پیت یا نیشانەیێ لە بریتی وشەیێ، بریوشە: *the ampersand and dollar sign are logograms* (logogrammatic *adj*) ۞ لوگوگرام
**logograph** /'lɒgəgrɑːf, US 'lɔːgəgræf/ (logographic adj) = logogram
**logogriph** /'lɔːgəgrɪf/ *noun*
جۆرێ خشتەی مەتەڵی ۞ نوعی جدول معمایی
**logomachy** /lə'gɒməki/ *noun, pl.* logomachies
شەڕەقسە، دمەدمە، شەڕەوشە ۞ نزاع یا مجادله‌ی لفظی
**logorrhea** /ˌlɒgə'rɪə/ *noun,* US logorrhea
چەنەدرێژی، زۆربڵەیی، چەقەسرۆیی (logorrhoeic *adj*) ۞ پرحرفی
**logos** /'lɒgɒs/ *noun*
1 ئەقڵ، ئاوەز، لۆگۆس (لە فەلسەفەی یونانی کۆندا) 2 مەسیح 3 وشەی خودا ۞ 1 عقل 2 مسیح 3 کلمه‌الله
**logotype** *noun*
(چاپ) لۆگۆتایپ ۞ لوگوتایپ
**logrolling** /'lɒgrəʊlɪŋ, US 'lɔːgroʊ-, 'lɑːg-/ *noun*
1 تلارکردنەوەی کۆتەرە، خلۆرکردنەوەی کۆڵکەدار (بەنێو ئاودا) 2 دەستەوام(ی پەرلەمانی) ۞ 1 عمل غلتاندن کنده 2 زد و بند پارلمانی
**logroller** *noun*
تلارکەرەوە، خلۆرکەرەوە ۞ غلتاننده
**logrunner** *noun*
جۆرێ باڵندەی دەنگ‌خۆشی songbird سەرعەرزی ئەوسترالاسیایی Australasian [توخم *Orthonyx*: دوو جۆرن] ۞ نوعی پرنده
**-logue**, also US –log *suffix*
پاشگر: وتە، قسە، بیر، هزر (بنەڕەت: لە *-logue* فەرەنسی، لە *-logos, -logon* یونانی‌یەوە) ۞ پسوند: سخن، فکر، اندیشه
**logwood** /'lɔːwʊd/ *noun*
بەقەم: دارێکی درکوداڵاوی کارائیبی، دڵی دارەکە ڕەشە و haematoxylin و ڕەنگەکانی تری لێ‌دەگرن [*Haematoxylon campechianum*] ۞ بقم
**-logy** *suffix*
پاشگر: 1 ـناسی، زانست، بیردۆز، تیۆری: *psychology, ethnology* 2 وتە، قسە: *phraseology* ۞ پسوند: 1 ـشناسی، دانش، نظریه 2 سخن
**logy** /'ləʊgi/ *adjective* (logier, logiest)
تەپلۆس، داتەپیو، تەمەڵ، گیان‌داگیراو ۞ کسل، تنبل
**Lohengrin** *noun,* German
لۆئێنگرین، لۆهێنگرین: کوری Parsifal و شۆڕەسواری Holy Grail لە ئەفسانەی ئەڵمانی‌دا ۞ لوهنگرین
**loin** /lɔɪn/ *noun*
1 کەلەکە، قەبرغە، نێوقەد، کەمەر 2 گۆشتی کەمەر 3 (loins) ئەندامە ڕەگەزی یان سێکسی‌یەکان، شەرمی ژن، شەرمی پیاو، گەڵ‌وگون، گەڵ‌وقوز، ئەندامی نێرینە یان مێیینە (بنەڕەت: لەسەر بنچینەی *lumbus* لاتین) ۞ 1 کمر، پهلو 2 گوشت کمر 3 (در جمع) اندام‌های جنسی
**loincloth** /'lɔɪnklɒθ, US -klɔːθ/ *noun*
پشتەماڵ، لونگ، فوتە، شەملک، شەرم‌پۆش ۞ لنگ
**loiterer** *noun*

سوورەسوورکەر، خاوەخاوکەر، ساوەساوکەر ⟡ لویترر

**Loki** *noun*, Old Norse
لۆکی: خوایێکی نۆرس Norse ⟡ لوکی

**Lolita** /lə(ʊ)'liːtə/ *noun*
کچی عیشقن، کچێ کە زووتر لەباری سێکسییەوە پێگەیشتبێ (لە رۆمانی *Lolita*ی (1958) Vladimir Nabokov) ⟡ لولیتا

**lollapalooza** /ˌlɒləpə'luːzə/ *noun*, also lalapalooza
کەسێکی بەسام، شتی سەرنجڕاکێش ⟡ آدم باابهت، چیز جالب

**Lollard** /'lɒləd/ *noun*
لۆلارد: یەکێ لە شوێنکەوتووانی گۆڕانخوازی reformerی دینی لە ئینگلتەرە و سکاتلەند جان وایکلیف John Wyclif (دەوروبەری 1330–84) کە لە سەدەکانی 14 و 15 ئەشکەنجە دەدران (Lollardy *n*) ⟡ لولارد

**Lollardism** *noun*
لۆلاردیزم، لۆلاردباوەڕی ⟡ لولاردیسم

**lollipop** /'lɒlipɒp, US 'lɑːlipɑːp/ *noun*
1 نوقل 2 ئەلاسکە، بەستاو، = ice lolly ⟡ 1 نقل 2 بستنی یخی

**lollipop man** *noun*
یارمەتیدەری پەڕاندنەوەی منالان، ماشێنڕاگر (لە خوێندنگاکاندا و دامەزراو لەوێ) ⟡ کمک‌کننده‌ی عبور دادن بچه‌ها

**lollipop woman** *noun*
یارمەتیدەری پەڕاندنەوەی منالان، ماشێنڕاگر (ژن، لە خوێندنگاکاندا و دامەزراو لەوێ) ⟡ کمک‌کننده‌ی عبور دادن بچه‌ها

**lolly** /'lɒli, US 'lɑːli/ *noun*, *pl.* lollies
1 = lollipop 2 (بریتانیا) پارە 3 (ئەوسترالیا) boiled sweet ⟡ پول

**Lombard** /'lɒmbəd, US -bɑːd/ *noun*
1 ئەندامی گەلێکی ئەلمانی کە لە سەدەی 6 دا پەلاماری ئیتالیایان دا 2 خەلکی Lombardy لە باکووری ئیتالیا 3 زاراوەی ئیتالیایی لۆمباردی (Lombardic *adj*: سەربە Lombard) ⟡ لومبارد

**Lombard poplar** *noun*
جۆرێ سپیداری رەشی ئیتالیایی، سپیداری لوول [*Populus nigra var. italica*] ⟡ نوعی درخت تبریزی

**loment** /'ləʊmɛnt/ *noun*, also lomentum /lə(ʊ)'mɛntəm/
(رووەکناسی) کەلووی هێندێ گیای دانەوێلەیی leguminous plant (بنەڕەت: لە لاتینەوە بە واتای "bean meal") ⟡ نیام برخی از گیاهان بُنشَنی

**London clay** *noun*
گڵی لەندەن: چینێ لە باشووری رۆژهەلاتی ئینگلتەرە پێکدێنێ، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی Eoceneی پاشین ⟡ خاک لندن

**London plane** *noun*
جۆرێ چناری متوربەکراو [*Platanus* × *hispanica*] ⟡ نوعی چنار

**London pride** *noun*
جۆرێ saxifrage [*Saxifraga* × *urbium*] ⟡ نوعی سفرس

**lone** /ləʊn, US loʊn/ *adjective*
تەنیا، تاکوتەنیا، (تەنیابال)، بێکەس، بێهەڤال، *a lonne sailor crossing the Atlantic* :solitary ◊ *a lone mother/parent/father* loneness /ləʊnəsn, US loʊnnəs/ *n*) کورتەی alone) ⟡ تنها، تک و تنها

**loneliness** /ləʊnlinəs, US loʊnlinəs/ *noun*
تەنیایی، بە تەنێبوون، بێکەسی: *a period of loneliness in his life* ⟡ تنهایی

**lonely** /'ləʊnli, US 'loʊn-/ *adjective* (lonelier, loneliest)
1 تەنیا، تاکوتەنیا، بێکەس، دڵتەنگ، کۆلیل، غەریب، lonesome ،solitary ،lone 2 چەپەک، لاپەر، لاتەریک، پەرت، دوور، دوورەدەس (loneliness /'ləʊnliəs, US 'loʊn-/ *n*) ⟡ 1 تنها، تک و تنها، غمگین، غریب 2 دورافتاده

**lonely hearts** *noun*, *pl.*
دڵە تەنیاکان (= ئاماژە بەو کەسانەیە کە بە ئاگاداری لە رۆژنامەکاندا بەدوای هاوسەر یان دۆستەوەن) ⟡ دل‌های بی‌پناه

**lone-parent family** = one-parent family

**loner** /'ləʊnə(r), US 'loʊn-/ *noun*
کەسێکی گۆشەگیر، مرۆی لاتەریک، بنیادەمی گۆشەگیر ⟡ آدم منزوی

**lonesome** /'ləʊnsəm, US 'loʊn-/ *adjective*
1 تەنیا، تاکوتەنیا، (تەنیابال)، بێکەس، دڵتەنگکەر: *I felt so lonesome after he left* 2 چەپەک، لاپەر، لاتەریک، پەرت، دوور، دوورەدەس: *a lonesome road* ⟡ 1 تنها، تک و تنها، غریب، دلتنگ‌کننده 2 دورافتاده

**lonesomeness** /'ləʊnsəmnəs, US 'loʊn-/ *noun*
1 تەنیایی، تاکوتەنیایی، بێکەسی 2 چەپەکی، لاپەری، پەرتی، دووری، دوورەدەسی ⟡ 1 تنهایی، تک و تنهایی 2 دورافتادگی

**lone star tick** *noun*
جۆرێ گەنەی ixodid (*Amblyomma americanum*)ی باشوور و ناوەند و رۆژهەلاتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. دەداتە شیردەر و بالندەکان و راگوێزەری چەندین نەخۆشییە (وەک Rocky Mountain spotted fever و ehrlichiosis) ⟡ نوعی کنه

**lone wolf** *noun*

مرۆی لاتەریک، بنیادەمی گۆشەگیر، کەنارنشین، دوورەپەرێز، بە هەردی کەس‌نەکەوتوو ۞ آدم منزوی

**long**[1] /lɒŋ, US lɔːŋ/ *adjective* (longer, longest), *adverb*, *noun*

*adj* 1 درێژ، دووڕودرێژ، کۆن، لەمێژینە 2 (لە جل‌وبەرگ‌دا) درێژ 3 (دەنگ‌ناسی) درێژ *adv* (بە) ماوەی، زۆر دەمێکە، ماوەیەکی زۆر *n* 1 ماوەیەکی زۆر، ماوەیەکی دووڕودرێژ 2 برگە، بزوێن یان دەنگی درێژ ۞ *adj* 1 دراز، طولانی، مدید، قدیم 2 بلند 3 (آواشناسی) کشیده *adv* بە مدت، مدت زیادی *n* 1 مدت زیاد 2 هجا، مصوت یا صدای کشیده

**long**[2] *abbreviation* longitude

**longan** /ˈlɒŋg(ə)n/ *noun*

(لە چینی‌یەوە) چاوەهەژدیها: بەریکی ناوداری ڕووەکێکی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا [*Dimocarpus longan*] ۞ لونگان

**long-and-short work** *noun*

(بیناسازی) بەردچنی بەرز و کورت ۞ سنگ‌چین دراز و کوتاه

**long-awaited** *adjective*

زۆر چاوەڕێ‌بوو، بە ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان‌بوو ۞ خیلی انتظارکشیده

**longboard** *noun*

تەختەدرێژە، جۆری surfboard ی درێژ ۞ لانگ‌بورد

**longboat** = longship

**longbow** /ˈlɒŋbəʊ, US ˈlɔːŋboʊ/ *noun*

کەوانی درێژ، کەوانەدرێژە ۞ کمان بلند

**long-case clock** = grandfather clock

**long-dated** /ˈlɒŋ deɪtɪd/ *adjective*

درێژماوە، ماوەدرێژ ۞ طویل‌المدت

**long-distance** *adjective, adverb*

*adj* ڕێگای دوور (ودرێژ)، دوور: *long-distance flights* *adv* لە ڕێگای دوورەوە: *to call long distance* ۞ *adj* راه دور *adv* از راه دور

**long-distance call** *noun*

تەلەفونی ڕێ(گا)ی دوور ۞ تلفن راه دور

**long-distance race** *noun*

پێشبڕکێی ڕاکردنی دوور یان ڕێی دوور ۞ مسابقەی دو استقامت

**long-distance runner** *noun*

ڕاکەری ڕێی دوور ۞ دوندەی دو استقامت

**long division** *noun*

(بیرکاری) دابەش‌کردنی دووڕودرێژ ۞ تقسیم تفصیلی

**long dozen** *noun*

سێزدە دەنک یان دانە (کە یەکێ زیاترە لە دوجین) ۞ سیزده عدد

**long-drawn-out** *adjective*, also long-drawn

درێژ، دووڕودرێژ: *The trial was a long-drawn-out affair* ۞ طولانی

**long drink** *noun*

خواردنەوەی (سارد و پڕ) لیوانی (وەکوو لیمۆناد یا بیرە) ۞ لانگ درینک

**longed-for** *adjective*

(لەمێژە) بەتەمابوو، بەهیوابوو ۞ مطلوب

**longeval** *adjective*

بەتەمەن، بەعومر، تەمەن‌درێژ ۞ معمر

**longevity** /lɒnˈdʒevəti, US lɑːn-, lɔːn-/ *noun*

تەمەنی درێژ: *a study of longevity* ۞ عمر طولانی، طول عمر

**long face** *noun*

دڵپڕ، خەمبار، بەپەرۆش، دڵتەنگ، لووت‌داژەنیو ۞ محزون

**long-faced** *adjective*

دڵپڕ، خەمبار، بەپەرۆش، دڵتەنگ، لووت‌داژەنیو ۞ محزون

**longhaired** *adjective*

1 قژدرێژ، پرچ‌درێژ 2 پشیلەیێکی نژاد مووودرێژ ۞ 1 موبلند 2 لانگ‌هیرد

**longhand** /ˈlɒŋhænd, US ˈlɔːŋ-/ *noun*, in longhand

(نووسین) بە دەست، دەستی، دەسی، بە دەس (نە تایپ) ۞ با دست

**long haul** *noun*

1 ڕێگای دوور، سەفەری دوور(ودرێژ) 2 ماوەیەکی زۆر، درێژماوە ۞ 1 سفر طولانی 2 مدت زیاد

**long-haul** *adjective*

(فڕین و هتد) دوور، دووڕودرێژ ۞ طولانی

**long-headed** *adjective*

1 زیرەک، دووربین 2 سەردرێژ ۞ 1 عیار 2 درازسر

**long-headedness** *noun*

1 زیرەکی، دووربینی 2 سەردرێژی ۞ 1 عیاری 2 درازسری

**longhorn** /ˈlɔŋhɔːn, US -hɔːrn/ *noun*

گیانەوەری شاخ‌درێژ ۞ جانور درازشاخ

**longhorn beetle** *noun*

قالۆنچەی شاخ‌درێژ [خێزانی Cerambycidae] ۞ سوسک درازشاخک

**longi-** *prefix*

پێشگر: درێژ ۞ پیشوند: دراز

**longicorn** /ˈlɒn(d)ʒɪkɔːn/ = *longhorn betle*

**longing** /ˈlɒŋɪŋ, US ˈlɔːŋ-/ *noun, adjective*

*n* خۆزگە، بریا، ئاوات، هیوا، ئارەزوو، عەزرەت، حەیبەت، تاسە، تامەزرۆیی، پەرۆشی *adj* بەتاسە ۞ *n* آرزو، اشتیاق *adj* مشتاق

**longingly** /ˈlɒŋɪŋli, US ˈlɔːŋ-/ *adverb*

به تاسەوە، بە پەرۆشەوە ۞ با اشتیاق

**longish** /ˈlɒŋɪʃ, US ˈlɔːŋ-/ *adjective*
◊ *There was a longish pause* : کەمێ درێژ: *longish hair* ۞ نسبتاً طویل

**longitude** /ˈlɒŋɡɪtjuːd, ˈlɒndʒɪ-, US ˈlɑːndʒətuːd/ *noun*
(جوگرافیا) هێڵی درێژ، درێژەهێڵ، درێژی جوگرافیایی (بنەڕەت: لە *longitude* لاتین، لە *longus* "درێژ") ۞ طول جغرافیایی

**longitudinal** /ˌlɒŋɡɪˈtjuːdɪnl, -ndʒɪ-, US ˌlɑːndʒəˈtuːdnl/ *adjective*
1 سەربە longitude درێژەهێڵی: *the town's longitudinal position* 2 بە درێژایی، درێژاودرێژ: ۞ 1 وابستە بە طول جغرافیایی 2 طولی، در طول

**longitudinally** /-nəli/ *adverb*
بە درێژی ۞ بە طور طولی

**long johns** *noun, pl.*
(نافەرمی) ژێردەرپێ، ژێرپاتۆڵ، ژێرشەڵوار ۞ زیرشلواری پشمی

**long jump** *noun*
بازی درێژ ۞ پرش طول

**long jumper** *noun*
بازدەری (بازی) درێژ ۞ پرش‌کنندەی پرش طول

**long-lasting** *adjective*
دووورودرێژ، درێژماوە، درێژخایەن، ۞ طولانی، درازمدت

**long-lasting effect** *noun*
کاریگەری درێژخایەن، باندۆری درێژماوە ۞ اثر درازمدت

**long-lasting result** *noun*
ئەنجامی درێژماوە یان درێژخایەن ۞ نتیجەی درازمدت

**long-life** *adjective*
(شیر و...) درێژماوە (بەکارهێنانی شتێ) ۞ دارای تاریخ مصرف طولانی

**long-lived** *adjective*
1 تەمەن‌درێژ، بەعومر 2 درێژماوە، درێژخایەن، دوورودرێژ، بۆ ماوەیەکی زۆر ۞ 1 دارای عمر طولانی، معمر 2 طولانی

**long-lost** *adjective*
گوم‌بوو یان نادیار (بۆ ماوەیەکی زۆر) ۞ گم‌شده

**long measure** *noun*
(کۆن) پێوەری درێژی ۞ مقیاس طولی

**Longobard**, *pl.* Longobards or Longobardi = Lombaed

**Longobardic** = Longobardic

**long odds** *noun, pl.*
(لە گریودا) پەنجا لە یەک، ئەگەری کەم ۞ احتمال ضعیف

**long-playing record** *noun*, also long-player
گرامافۆنی 33 سووڕ یا خول ۞ صفحەی 33 دور

**long-range** *adjective*
1 دوورهاوێژ، دوورپێک، درێژ، مەودادوور: 2 درێژماوە، درێژخایەن: *long-range missiles* 2 *long-range plans* ۞ 1 دوربرد 2 درازمدت

**long running** *noun*
درێژخایەن، درێژماوە، زۆرخایاندوو ۞ درازمدت

**longship** *noun*
کەشتی درێژ، درێژەکەشتی (لە لایەن ڤایکینگ و گەلانی تری باکووری ئەورووپاوە بەکاردێترا) ۞ کشتی دراز

**longshoreman** /ˈlɒŋʃɔːmən:, US ˈlɔːŋʃɔːrmən/ *noun, pl.* -horemen
کرێکاری لەنگەرگا (یا لەنگەرگە) ۞ کارگر بارانداز

**long shot** *noun*
مەترسی، ئەگەری کەم، رێی تێناچێ ۞ خطر، احتمال کم

**longsighted** *adjective*
1 داهاتووبین، بەمشوور، تێگەیشتوو 2 چاوتیژ، دووربین: *She's long-sighted and needs glasses to read* (longsightedly *adv*: داهاتووبینانە، بەمشوورانە، تێگەیشتووانە؛ -ightedness *n*: 1 داهاتووبینی، بەمشووری، تێگەیشتوویی 2 چاوتیژی، دووربینی) ۞ 1 دوراندیش 2 دوربین

**longspur** *noun*
یەکێ ئەمریکای باکووری [توخم bunting *Calcarius*] ۞ نوعی پرنده

**long-standing** *adjective*
کۆن، لەمێژینە، دێرین، بەپێشینە، درێژخایەن ۞ قدیمی، سابقەدار

**long-suffering** *adjective*
1 خۆگرتوو، پشوودرێژ، بەتاقەت، بەسەبر، سنگ‌فراوان 2 رەنجبەر، چەوساوە، رەتێنراو، زۆرلێکراو ۞ 1 صبور، شکیبا 2 ستم‌دیده

**long suit** *noun*
(پەرین) دەستی براوە ۞ دست برنده

**long-tailed tit** *noun*
گوڕەوی‌چنەی کلکدرێژە [ *Aegithalos caudatus* و جۆرەکانی تر، خێزانی Aegithalidae] ۞ نوعی چرخ‌ریسک

**long-term** *adjective*
درێژماوە، درێژخایەن، لەمێژینە: *seeking long-term solutions* ۞ درازمدت، قدیمی

**long-time** *adjective*
کۆن، لەمێژینە، دێرین، دوورودرێژ، درێژخایەن، long-standing: ◊ *his long-time colleague* *a longtime friend* ۞ قدیمی، دیرین، باسابقه

**Long Tom** *noun*
1 جۆرێ تۆپی گەورەی دەریایی دوورهاوێژ 2

جۆرێ کۆل یان جێگایێکی تایبەتی زێرشتنەوە ◌ لانگ تام

**long ton** *noun*

تۆنی گەورە (بەرامبەر بە 1016/06 kg یان 2240 پەوند) ◌ تن بزرگ

**longueurs** /lɒŋ'gɜːz, US loʊŋ'gɜːrz/ *noun*

درێژدادری ◌ اطناب

**long vocation** *noun*

پشووی هاوینی، پشووی درێژ، هاوینەپشوو ◌ تعطیلات تابستان

**long wave** *noun*

(رادیۆ) شەپۆلی درێژ ◌ موج بلند

**longways** /'lɒŋweɪz, US 'lɔːŋ-/ *adverb*, also longwise

درێژ، (شەپۆلی)، بە درێژی درێژ (هەروەها lengthways) ◌ (به طور) طولی

**longwearing** *adjective*

بەرگەگر، نەدڕ، قایم، نەوڕ، بەدەوام ◌ بادوام

**long weekend** *noun*

پشووی چواررۆژە (دوایی حەوتوو) ◌ تعطیلات چهارروزه

**long-winded** /ˌlɒŋ 'wɪndɪd/ *adjective*

(ناپەسند) درێژدادڕ، دوورودرێژ؛ وەڕەس‌کەر، عاجزکەر، جارس‌کەر، tedious: *a long-winded process ◊ winded speaker* ◌ درازنفس، طولانی؛ خسته‌کننده

**long-windedness** *noun*

درێژدادری؛ وەڕەس‌کەری، جارس‌کەری ◌ درازنفسی؛ ملال‌آوری

**long-wise** /'lɒŋwaɪz, US 'lɔːŋ-/ = longways

**lonicera** /lɒ'nɪs(ə)rə/ *noun*

(رووەک‌ناسی) لۆنیسێرا: رووەکی تیرەیێ کە honeysuckle ەکان دەگرێتەوە [تۆخم *Lonicera*] (بنەڕەت: لاتینی نوێ، لە ناوی رووەک‌ناسی ئەڵمانی سەدەی شازدە Adam *Lonitzer*) ◌ نوعی گیاه

**lonning** = loan2

**loo**[1] /luː/ *noun*

(نافەرمی، بریتانیا) دەستاو، دەسبەئاو، کەناراو ◌ توالت

**loo**[2] /luː/ *noun*

جۆرێ قومار بە پەڕین ◌ لو

**loofah** /'luːfə/ *noun*

1 لفکە 2 رووەکێکی هەڵچووی گەرمێنان لە خێزانی gourd [*Luffa cylindrica*] (لە دار. بنەڕەت: لە *lūfa* عەرەبی میسرییەوە) ◌ لیف

**look** /lʊk/ *noun, interjection*

*n* 1 روانین، چاولێکردن، سەیر، سەیرکردن، بینین 2 سەروسەکوت، دەموچاو، چروچاو، سەروچاو، دیمەن، روخسار، رواڵەت، رووکەش 3 شێوە، شێواز، داب، مۆد 4 گەران، پشکنین 5 (looks) قیافە، جوانی، ڕێک‌وپێکی، شۆخی *inter* چاو! چاوکە! شا! ئەها! ها! تەماشاکە! بنێرە! بڕوانە! ◌ *n* 1 نگاه 2 سر و وضع، نمود، ظاهر 3 سبک، مد 4 جستجو 5 (در جمع) قیافه، قشنگی *inter* نگاه کن!

**look-alike** /'lʊkəlaɪk/ *noun, adjective*

1 لێکچوو، هاوشێوە، وەکیەک، کۆپی، دەق 2 شێوەی یەک دەدا، وەکوویەک ◌ 1 شبیه، بدل 2 شبیه به هم

**looker** /'lʊkə(r)/ *noun*

1 (نافەرمی) تەماشاڤان، تەماشاوان، بینەر، سەیرکەر 2 جوان، لەبار، تیکە (ژن یان کچ)، (نافەرمی) کەسێکی زۆر سەرنج‌ڕاکێش ◌ 1 تماشاگر 2 زیبا، لعبت، آدم بسیار جذاب

**looker-on** /lʊkə(r) 'ɒn/ *noun*

تەماشاڤان، تەماشاوان، بینەر، سەیرکەر، چاولێکەر ◌ تماشاچی

**look-in** *noun*

1 دەسپەرژ، دەلیفە، دەرفەت 2 چاوپیاخشاندن ◌ 1 فرصت 2 نظر اجمالی

**looking glass** *noun*

ئاوێنە، قودیک، جام ◌ آیینه

**lookism** *noun*

رواڵەت‌گەری، رواڵەت‌بازی، جیاوازی‌دانان یان زووبڕیاردان لە رووی رواڵەتەوە ◌ ظاهرپرستی، تبعیض یا پیش‌داوری از روی ظواهر

**lookist** *noun, adjective*

رواڵەت‌گەر، رواڵەت‌باز، زووبڕیاردەر لە رووی رواڵەتەوە ◌ ظاهرپرستی، پیش‌داوری‌کننده از روی ظواهر

**lookout** /'lʊkaʊt/ *noun*

1 وریایی، ئاگاداری، گوێ‌قولاخ‌بوون، هۆشیاری، چاودێر، زێرەڤان، چاوبەسەر، نۆبەدار، پاسەوان، دیدەوان، شوێنی چاودێری یان پاسەوانی، *a lookout ◊ on the lookout* :watchman 2 دیمەن، پێشچاو point/tower ◌ 1 مراقبت، نگهبان، محل نگهبانی یا دیده‌بانی 2 چشم‌انداز

**look-over** *noun*

1 چاوپیاخشاندن، کورتە چاولێ‌کردن 2 کورتە پشکنین، کورتە تاقی‌کردنەوە ◌ 1 نظر اجمالی 2 بازرسی یا امتحان اجمالی

**look-see** *noun*

(نافەرمی) چاوپیاخشاندن، کورتە چاولێ‌کردن: *Come and have a look-see* ◌ نگاه اجمالی

**loom**[1] /luːm/ *noun*

دەزگای چنین، دەزگا یان داروباری تەون، دەزگای جۆلایی (بنەڕەت: *gelōma* ئینگلیسی کۆن "tool"، بووەتە *lome* لە ئینگلیسی نێوەڕاست) ◌ ماشین پارچه‌بافی، دستگاه جولایی

**loom**[2] /luːm/ *noun*

دەرکــەوتن لــە نێــو هــەورەوە، دەرکــەوتنی هەوەڵجاری تەماوی دەریا ◌ لوم

**loon** /lu:n/ *noun*

1 (باڵندەناسـی) لـوون، = diver3 2 (نافـەرمی) مرۆی سەیر یان گەوج، بەکارنەهاتوو ◌ 1 مـرغ غواص 2 آدم احمق

**loonie** *noun, pl.* loonies

کـۆینی یـەکدۆلاری کەنـەدایی ◌ سـکەی یکدلاری کانادایی

**loony** /'lu:ni/ *noun* (*pl.* loonies), *adjective* (loonier, looniest)

(نافەرمی، مرۆی) شێت، حەپۆل، عەقڵسووک، حەپەمێشخوەر ◌ (آدم) دیوانه، خل

**loony-bin** *noun*, also loony bin

(نافەرمی، سووکانە) شێتخانە، نەخۆشخانەی دەروونی، شـوێنی نـەخۆشـە دەروونییـەکـان، madhouse ◌ تیمارستان

**loop** /lu:p/ *noun*

1 ئاڵقە، ئەڵقە، چەمەرە، گەوە، کەمە، قەف، چـەرخ، پـێچ، چـەماوی 2 گـرێ 3 قـەف یـان ئاڵقەی تەناف 4 قوڵفە، دەسک، مشتە 5 خولگە یان بازنەیەکی تەواو بۆ تەزوو (یان تەوژم)ی کارەبا 6 (بۆ سکپڕنەبوون) دەزگا 7 (فرۆکە) دەور، چەرخ 8 (بریتانیا) رێگا یان هێڵی (رێی ئاسن) لادان 9 (فیلم، باریکە و هتد) ئاڵقە، قەف، لـوول 10 (the Loop) ناوەنـدی بازرگـانی شـیکاگۆی ئـەمریکا ◌ 1 حلقــه، خمیــدگی 2 حلقەی طناب 3 گره 4 دسته 5 مدار کامل برای جریان برق 6 آیوودی 7 دور 8 (بریتانیا) جاده یا خط انحرافی 9 حلقه 10 لوپ

**looper** *noun*

1 (هەروەهـا inchworm، تەتلەمیران) قەفۆکە: تـەتـلەمـیرانی پـەپوولـەیێکـی شـەوگـەڕی geometrid [خێزانـەکـانی Geometridae و Noctuidae] 2 ئـامێری قەفاندن، قـەفـەنـگ، قەفانچەلە، قەفەنە ◌ لوپر

**loophole** /'lu:phəʊl, US -hoʊl/ *noun*

1 دەلاقـە، کـون، کەلەبـەر، قـلیش، کـەلێن 2 (خـوازە) دەرەتـان، رێـی دەرچـوون، رێگـای دەرچوون، رێگا، دەروو: ◊ *a legal loophole* 3 *to close existing loopholes* کـونی تیرهاویـشتن، کوناوەجـە ◌ 1 روزنـه، سـوراخ، شکاف 2 (مجازی) مفر 3 مزغل

**loop-line** /'lu:p laɪn/ *noun*

(رێی ئاسن) دووڕیانە، دووڕێیانە، رێگای لادان ◌ خط انحرافی

**Loop of Henle** /'hɛnli/ *noun*

چەلەمەی هێنلی: بەشێ لە بۆریچکەی گورچیلە (بە شێوەی U)، لەوێوە ئاو و خوێ دەمژرێتەوە بۆ نێـو خـوێن (بـنەڕەت: لـە نـاوی توێکـاری ئەڵمانی *F. G. J. Henle*) ◌ لوپ اف هنلی

**loopy** /'lu:pi/ *adjective* (loopier, loopiest)

شـێت، دەڵـوو، گەوجانـە (*adv* loopily؛ loopiness *n*) ◌ دیوانه، احمقانه

**loose** /lu:s/ *adjective* (looser, loosest)

1 بەرەڵا، نەبەسراو، رەها، جیا، ئازاد، بەردراو، بەلەسە، شلوشەویق، شلومل، نەتوند، پفەڵ، فشەلۆک، خۆنەگرتوو، شل، لەق(ولۆق)، لۆق، دانەکوتراو: *a* ◊ *a lion loose in the streets* *a fabric* ◊ *loose soil* ◊ *loose tooth/button* *a loose* ◊ *with a loose weave* 2 *alliance/coalition/federation* فــــش، فشوفۆڵ، هەراو، گوشاد، شەپوشۆڕ دەڵب، زل: 3 *a loose shirt* (ملیوان) گەورە، زل 4 هەڵرژاو، داکراو، ئاچخ: *The potatoes were* 5 *sold loose, not in bags* بێسەروبەرە، نادروست، نادە فشە، نائاگادار، ناوریا، ناهۆشیار: 6 *loose thinking* ◊ *a loose translation* سست، شێواو، شپرزە 7 جلف، سووک، بلح، هەرزە: 8 *a young man of loose morals* (چەر) هەرز، بریو، شلەوەبوو 9 شیاوی راگوێستن، دەگوێزرێتەوە 10 = (کۆن) = disconnected، detached ◌ 1 رها، ول، شل، جدا، لق 2 گشاد 3 بزرگ 4 فلەای 5 غیردقیق، بیدقت 6 بیربط، آشفته 7 بیبندوبار 8 هرز 9 قابل انتقال

**loose box** *noun*

تەویلەیێ کە لەودا ئەسپەکان نەبەسراونەتەوە ◌ لوس باکس

**loose change** *noun*

وردەپارە، وردەپوول، پوولەوردە، قەرەپوول، قۆشە ◌ پول خرد

**loose cover** *noun*

بەرگ، بەر، روو، رووکێش، داپۆش ◌ روکش

**loose end** *noun*

1 بەشـی نیـوەچڵ یـان تەواونـەکراو 2 لـێڵ، تەماوی، تەژمە 3 سەری ئازاد یان بەرەڵا 4 پاشماوە ◌ 1 بخش تمامنشده 2 مبهم 3 انتهای نخ 4 تەمانده

**loose ends** *noun, pl.*

شتە نـەزانراو یـان تـەماوییـەکان ◌ نکـات نادانسته یا مبهم

**loose-fitting** /'lu:s 'fɪtɪn/ *adjective*

(جلوبەرگ) فشوفۆڵ، فراوان، هەراو، فرت، دەڵب، فش، شەپوشۆڕ ◌ گل و گشاد

**loose forward** *noun*

(لە راگبیدا) یاریزانی پشتەوەی خڕبوونەوە scrum ◌ لوس فوروارد

**loose head** *noun*

(لە راگبیدا) یاریزانی ریزی پێشەوەی تیپێ لە خڕبوونەوەدا scrum کە نزیکترین جێگایە کە تۆپی لێ دانرێ ◌ لوس فوروارد

**loose-jointed** *adjective*

جومگەشل، زۆر ئازادانە دەجوولێ (وەک ئەو کەسانەی کە کردەوەی ئاکرۆباتیک دەکەن، (loose-jointedness *n* ◌ دارای مفاصل نرم

**loose-leaf** /ˈluːs ˈliːf/ *adjective*

(بەڕاو) لێوەبوو (بەڕ)، بەڕلەق، شلبەڕ، بەڕەشلە، ئازادبەڕ ◌ آزادبرگ

**loose-limbed** *adjective*

(ویزەیی) چالاک، چاپک، مەزبوون، گورج، توندوتۆل ◌ فرز، چابک

**loosely** /ˈluːsli/ *adverb*

1 شل، بە شێوەیەکی هەراو، دەلبانە، بە شێوەیەکی شل(وشەویق): *Hold the rope loosely between your finger and thumb* 2 سەرسەرەکی‌یانە، بە شێوەیێکی سەرسەرەکی (یان فشە)، بە بێ‌وردبوونەوە، بە بێ‌سەرنجی زۆرەوە، نە بە تەواوی، کەم‌تاکورتێ، تا ئەندازەیێ: *◊ to use a term loosely* *Economic growth can be loosely defined as an increase in GDP ◊ The two problems are only loosely related* ◌ بە طور گشاد، به طور شل، با مسامحه، کمابیش، تقریباً

**looseness** /ˈluːsnɪs/ *noun*

1 شلی، نەتوندی، دانەکوتراوی، لەقی 2 هەرزەیی، جلفی، بلحی 3 هەراوی، دەلبی، فشی ◌ 1 شلی، لقی 2 هرزگی 3 گشادی

**loose sentence** *noun*

رستەی شل، رستەیێ کە مانا یان واتاییکی دروستی نەبێ، رستەیێ کە بە رستە یان کلۆزی سەرەکی‌یەوە main clause کۆتایی نایە و یەک یان چەند برگە یان کلۆزی پاشکۆ یان واتابەندەکانی modifier دێ بە دوای‌دا دێ (بڕوانە periodic sentence) ◌ جملەی لوس

**loose smut** *noun*

نەخۆشی کوێروو یان ژەنگی دەغڵ‌ودان کە لەودا سەرجەم سەری دانەکان دەبنە تۆپەڵکەیێکی تۆزاوی یان گەرداوی سپۆر ◌ اسمات لوس

**loosestrife** /ˈluːsˌstrʌɪf/ *noun*

گیاییکی دەم‌ناوان [*Lythrum salicaria* (هی ئەرخەوانی)، *Lysimachia vulgaris* (هی زەردەکەی) و رووەکە پێوەندی‌دارەکان] ◌ نوعی گیاه

**loose-weave** /ˌluːs ˈwiːv/ *noun*

شل‌چن(راو)، شل چنراوە ◌ دارای بافت شل، شل‌بافت

**loot** /luːt/ *noun*

1 دەسکەوت، مالی دزراو، مالی دزیی، تالانی، spoils 2 تالان، چەپاو، راوڕووت 3 (نافەرمی) پارە، پوول، سامان، مالی دنیا ◌ 1 غنیمت، اموال مسروقه 2 غارت 3 پول، ثروت

**looter** /ˈluːtə(r)/ *noun*

تالانچی، راوڕووت‌کەر، چەپاوکەر ◌ غارت‌گر

**lop** /lɒp/ *noun*, also lop and top

لق‌وپۆی هەلپاچراو، سەرلق، چرپی‌وچال ◌ شاخ و برگ هرس‌شده

**lope** /ləʊp, US loʊp/ *noun*

گورگەلۆقە، شەقاو(هەلێنانەوە) ◌ تاخت، شلنگ

**lop-eared** /ˌlɒp ˈɪəd/ *adjective*

گوێ‌شۆڕ ◌ دارای گوش‌های آویخته

**loperamide** /ləʊˈpɛrəmʌɪd/ *noun*

لۆپی‌ریمایدٍ، لۆپیرامید (دەرمانێ بۆ زگەشۆرە) ◌ لوپی‌رامید

**lopho-** *prefix*

پێشگر: پۆپن، کاکۆل‌دار، پۆپەدار، تیغە، تاج‌دار، پۆپنە: (بــڕوانە: *lophophore*) لە *lophos* یۆنانی‌یەوە "ridge ،crest") ◌ پیشوند: کاکل‌دار

**lopophorate** *noun, adjective*

(گیانەوەری) پۆپەدار، تیغەوەر ◌ لوپوفوریت

**lopophore** /ˈləʊfɔˌfɔː, ˈlɒf-/ *noun*

(گیانەوەرناسی) پۆپەدار، تیغەوەر: ئەندام یان پێکهاتەیێکی نالیی horseshoe-shaped structure یان خڕ لای دەمی bryozoan ـەکان، brachiopod ـەکان و هێندێ بڕبڕەداری تری ئاوی کە ب.ت. بۆ وەرگرتنی خۆراک بەکاردێترین ◌ لوپوفور

**lopolith** /ˈlɒpə(ʊ)lɪθ/ *noun*

بەردەتەشت(ـینە)، جۆرێ بەردی ژێرپیالەئاسای ئاگرین ◌ لوپولیت

**lopper** *noun*

هەلپاچەر، داپاچەر، پاڕتاوتن‌کار ◌ هرس‌کننده، قطع‌کننده

**loppy** *adjective* (loppier, loppiest)

شل، شل‌وشەویق، لەق ◌ لق

**lop-sided** /ˌlɒpˈsaɪdɪd, US ˌlɑːp-/ *adjective*

لار، بەلاداکەوتوو، کەچ، گێر، لاسەنگ، لەنگ، نالەنگەر، ناهاوسەنگ، ناتەراز: *a lopsided grin/mouth* ◌ کج، نامتعادل

**lop-sidedly** /ˌlɒpˈsaɪdɪdli, US ˌlɑːp-/ *adverb*

بەلاداکەوتووانە، کەچانە، لاسەنگانە، گێرانە، لەنگانە، ناهاوسەنگانە، ناتەرازانە ◌ بە طور کج یا نامتعادل

**lop-sidedness** /ˌlɒpˈsaɪdɪdnəs, US ˌlɑːp-/ *noun*

لاری، بەلاداکەوتوویی، کەچی، گێری، لاسەنگی، لەنگی، نالەنگەری، ناهاوسەنگی، ناتەرازی ◌ کجی، نامتعادل بودن

**loquacious** /ləˈkweɪʃəs/ *adjective*

زۆربلە، هەلەوەڕ، چەنەدرێژ، چەقەسرۆ ◌ پرحرف، وراج

**loquaciousness** /ləˈkweɪʃəsnəs/ *noun*

زۆربلەیی، چەنەدرێژی، چەقەسرۆیی ◌

پرحرفی، وراجی

**loquacity** /lə'kwæsəti/ *noun,* also loquaciousness

زۆربلەیی، هەلەوەڕی، چەنەدرێژی ۞ پرحرفی، وراجی

**loquat** /'ləʊkwɒt, US 'loʊkwɑːt/ *noun*

لوکوات، داری لوکوات، بەری لوکوات (لە چین و ژاپــۆندا [*Eriobotrya japonica*]) ۞ لوکوات، درخت یا میوەی لوکوات

**lord** /lɔːd, US lɔːrd/ *noun, interjection* (Oh Lord, Good Lord)

*n* 1 دەســەلاتدار، بەڕێوەبــەر، کارگێــڕ، فەرمانگێڕ، سەروەر 2 خاوەنزەوی، دەرەبەگ، خان، ئاغا 3 (لە لێپرسیندا) بەڕێز، گەورەم، جەنابی 4 گەورەزادە 5 لۆرد (سەرناوێ لە بریتانیا) 6 (the Lord) خودا 7 عیسای مەسیح 8 (the Lords) ئەنجومەنی زووریەن، ئەندامی ئەنجومەنی زووریەن *interj* ماشەڵڵا، حەک خودایە ۞ *n* 1 حاکم 2 ارباب، آقا 3 جناب 4 اشرافزاده 5 لرد 6 (با L) خدا 7 عیسی مسیح 8 (the Lords) مجلس اعیان، عضو مجلس لردها *interj* وای خدای من

**lordliness** /'lɔːdlinəs, US 'lɔːrd-/ *noun*

1 خۆبەزلی، لەخۆباییبوون، لووتبەرزی، فیزنی 2 سەروەری، سالاری، گەورەیی ۞ 1 تکبر 2 سیادت

**lordling** *noun,* also lording

(کۆن، سووکانە) لۆردی بێدەسەلات ۞ لرد بدون نفوذ

**lordly** /'lɔːdli, US 'lɔːrd-/ *adjective* (lordlier, lordliest)

1 گەورە، مەزن، بەشکۆ: *a lordly mansion* 2 خۆبەزل، لووتبەرز، لەخۆبایی 3 لۆردئاسا ۞ 1 مجلل 2 مغرور 3 لردمانند

**Lord mayor** *noun*

شارەوانی لەندەن (و چەندین شاری گەورەی تر) ۞ شهردار لندن

**Lord of Appeal** *noun,* in full Lord of Appeal in Ordinary = law lord

**lord of misrule** *noun*

بەرپرسی خۆشی و شادییەکانی کریسمەس لە ئینگلتەرە، ب.ت. لە سەدەکانی پازدە و شازدەدا ۞ لورد اف میسرول

**lordosis** /lɔː'dəʊsɪs/ *noun, pl.* lordoses

(پزشکی) چەمانەوەی پێچەوانە، پشتەوەچەمین، چەمانەوەی یەکجاری بڕبڕەی پشت بۆ دواوە (بڕوانە kyphosis) ۞ لوردوز، لوردوسیس

**lordotic** *adjective*

سەربە یان پێوەندی بە lordosis ـەوە هەیە ۞ وابسته به لوردوز

**the Lord's Day** *noun*

یەکشەممە، ڕۆژی خودا، خوارۆژ ۞ یکشنبه

**lordship** /'lɔːdʃɪp, US 'lɔːrd-/ *noun*

1 جەنابی بەڕێز 2 هێز یان پلەوپایەی لۆردێتی، دەرەبەگی ۞ 1 عالیجناب 2 قدرت یا موقعیت لرد

**Lord's Prayer** *noun*

نوێژ یان نزای خواوەندی ۞ نماز یا دعای ربانی

**Lords spiritual** *noun, pl.*

(ئەنجومەنی زووریەن) نوێنەرانی ئایینی ۞ نمایندگان روحانی

**Lords temporal** *noun, pl.*

(ئەنجومەنی زووریەن) نوێنەرانی نائایینی ۞ نمایندگان غیرروحانی

**lore**[1] /lɔː(r)/ *noun*

زانست، ئاگایی، زانیاری، کۆمەڵە زانست یا زانیاری یا نەریتەکان لەبارەی بابەتێکەوە، زانیاری کەلەپووری یان فەرهەنگی، فەرهەنگ یا چاندی نەژادی و ڕەگەزی، (کۆن) فێرکردن، فێرکاری، شتێ کە فێری دەبی، وانە، داستانەکان، ئەفسانەکان ۞ دانش، دانستنیها، مجموعەی معلومات و سنن در حوزەای خاص؛ فرهنگ قومی، آموزش، تعلیم، درس، روایات

**lore**[2] /lɔː(r)/ *noun*

(گیانەوەرناسی) مەودای نێوان چاو و دەنووک (یا نێوان چاو و کونەلووتی مارەکان، شیپ، شیپە (بنەڕەت: لە *lorum* لاتین "strap ,thong") ۞ لور

**loreal** *adjective*

شیپی، شیپەیی، سەربە یان پێوەندی بە شیپەوە هەیە ۞ وابسته به لور

**lorgnette** /lɔː'njet, US lɔːr'njet/ *noun,* also lorgnettes

چاویلکە یان عەینەکی دەسکدرێژ ۞ عینک دستی

**lorgnon** = lorgnette

**lorica** *noun, pl.* loricae /-kiː/ or loricas

(گیانەوەرناسی) 1 زرێ، قاپیلک، قاوغ، لەبکە 2 زرێی ڕۆمی لە چەرم یان کانزا (لاتین بە واتای "breastplate") ۞ 1 زره 2 لوریکا

**loricate** *adjective*

زرێدار، قاپیلکدار، لەبکەدار، قاوغدار ۞ زرەدار

**lorikeet** /'lɒrɪkiːt/ *noun*

لۆریکیت (باڵندەیەکی چکۆلانە لە خێزانی لۆری lory، زۆرتر لە گێنەی نوێ [*Charmosyna* و تۆخمەکانی تر، چەندین جۆرن]) ۞ لوریکیت

**loris** /'lɔːrɪs/ *noun, pl.* lorises

جۆرێ گیانەوەری خاوی شەوگەڕی چکۆلە، لەنێو گژوگیای چڕی ئاسیای باشووریدا دەژی [*Loris tardigradus*](هی باریک) و تۆخمی *Nycticebus* (هی خاو)] ۞ لوریس

**lorn** /lɔːn/ *adjective*

1 خەمبار، دلتەنگ، کز، مات 2 تەنیا، تاق، تاک
◌ 1 اندوهگین 2 تنها
**Lorraine cross** = cross of Lorraine
**lorry** /ˈlɒri, US ˈlɔːri/ *noun, pl.* lorries
لۆری، ماشێنی باری یان بارهەڵگر ◌ کامیون
**lory** /ˈlɒri, US ˈlɔːri/ *noun, pl.* lories
(باڵندەناسی) لۆری: تووتی ئەوسترالیایی یان رۆژهەلاتی ئاسیا [خێزان Loridae: زۆر جۆرن] ◌ لوری
**Los Angeleno** = Angeleno
**loser** /ˈluːzə(r)/ *noun*
1 دۆڕاو، دۆڕاندوو، داناو، بەزیو، ژێرکەوتوو: *He's a good/bad* ◊ *winners and losers* 2 *loser* زەرەرمەند، زیانکار، زیانبار، زەرەربار، زیانلێکەوتوو 3 گومکەر، ونکەر ◌ 1 بازنده 2 متضرر 3 گم‌کننده
**losing** *noun, adjective*
*n* دۆڕان، بەزین، دانان *adj* دۆڕەر، دەیدۆڕێنێ ◌ *n* باخت *adj* بازنده
**losing battle** *noun*
شەڕی بەزیوانە یان شکستی دوایی دیارە ◌ نبرد باختنی
**losing party** *noun*
(ماف) لایەنی دۆڕاو یان دۆڕاندوو، بڕیارلەسەردراو ◌ محکوم‌علیه
**loss** /lɒs, US lɔːs/ *noun*
1 زیان، خەسار، زەرەر، زرار، زەربە، گورز 2 دۆڕان، دانان، تێشکان، بەزین، شکست 3 گومبوون، نادیاری، لەبەرچاونەبوون، ونبوون، لێکەوتن، بزربوون 4 لەدەس‌چوون، مردن، نەمان، لەکیس‌چوون، لەدەس‌دان 5 لەکیس‌چوون، زایەبوون، بەهەدەرچوون، بەفیڕۆچوون ◌ 1 ضرر، خسارت، صدمه 2 باخت، شکست 3 گم شدن 4 فقدان 5 تلف شدن
**loss leader** *noun*
شتی کڕیارڕاکێش، شتی فریودەر (شتێ کە بە زەرەر دەفرۆشرێ تا سەرنجی خەڵک ڕاکێشێ) ◌ کالای مشتری جلب‌کن
**loss-making** *noun*
سەربە زەرەر، زەرەرکەر، زیاندەر، خێرنەدەرەوە، قازانجنەکەر ◌ ضررده
**lost**[1] /lɒst, US lɔːst/ *adjective*
1 گومبوو، نەماو، ونبوو، بزر، نادیار 2 لەدەس‌چوو، لەکیس‌چوو، لەنێوچوو 3 دۆڕاندوو، داناو، بۆڕ ◌ 1 گم‌شده 2 مفقود، ازدست‌رفته 3 باخته
**lost**[2] /lɒst, US lɒːst, US lɔːst/ = past and past participle of lose
**lost-and-found** *noun*
شوێنی کەل‌وپەلی گەم‌بوو، گوم‌خانە ◌ مکان اشیاء گم‌شده
**lost cause** *noun*
کاری سەرنەگرتوو یا بێهوودە، هەوڵی بێ‌ئەنجام ◌ تلاش بی‌حاصل
**lost generation** *noun*
1 بەرەی تیاچوو یان لەنێوچوو (ب.ت. شەڕی جیهانی یەکەم) 2 کۆمەڵێ لە نووسەرانی لاوی ئەمریکایی کە لە نێویاندا ئێرنێست هێمینگوای Ernest Hemingway تیایە ◌ نسل ازدست‌رفته
**lost labour** *noun*
(کۆن) هەوڵی بێ‌ئەنجام یان سەرنەگرتوو ◌ تلاش بی‌حاصل
**lost property** *noun*
1 کەل‌وپەلی گەم‌بوو یان گومێتی، گومەمەنی، شت‌ومەکی ونبوو یان نادیار 2 شوێنی کەل‌وپەلی گەم‌بوو یان گومێتی ◌ 1 اشیاء گم‌شده 2 مکان اشیاء گم‌شده
**lost-property office** *noun*
نووسینگەی کەل‌وپەل یان شت‌ومەکی گوم‌بوو ◌ دفتر اشیاء گم‌شده
**lot** /lɒt, US lɑːt/ *noun, adjective*
*n* 1 هەموو، گشت، تێکرا، دەستە، گرووپ، کۆمەڵ 2 بەش، پشک 3 بابەت، قەڵەم، برگە، دەمبر (ب.ت. لە مەزاتێکدا) 4 چارەنووس، نێوچاوان، بەخت 5 پەڵە زەوی، پارچە یان تیکە زەوی 6 پشک، پشک‌هەڵخستن، نێوکێشی، بەخت‌کێشی *adj* زۆر، گەلێ، زەعف ◌ *n* 1 تمام، گروه 2 سهم 3 فقره 4 سرنوشت 5 قطعه‌ی زمین 6 قرعه، قرعه‌کشی *adj* زیاد، خیلی
**loth** = loath
**Lothario** /ləˈθɛːriəʊ, US -ˈθɑː-/ *pl.* Lotharios = womanizer
**loti** /ˈləʊti, ˈluːti/ *noun, pl.* maloti /məˈləʊti, -ˈluːti/
یەکەی بنەڕەتی پارەی لێسۆتۆ، بەرامبەر بە سەد sente ◌ لوتی
**lotic** /ˈləʊtɪk/ *adjective*
(ژینگەناسی) ژیوار دەکا یان هەڵکەوتووە لەسەر ئاوی خێراجوولاوی شیرین یا شەپۆلەخێراکان (بڕوانە lentic) ◌ لوتیک
**lotion** /ˈləʊʃn, US ˈloʊʃn/ *noun*
گیراوە، لوشێن: *(a) body/hand lotion* ◊ *suntan lotion* ◌ محلول
**lottery** /ˈlɒtəri, US ˈlɑːt-/ *noun, pl.* lotteries
1 پشک، بەخت‌تاقیکردنەوە 2 (خوازە) قومار ◌ 1 بخت‌آزمایی 2 قمار
**lotto** /ˈlɒtəʊ, US ˈlɑːtoʊ/ *noun*
1 لاتۆ (جۆرێ قومار) 2 = lottery ◌ لوتو
**lotus** /ˈləʊtəs, US ˈloʊ-/ *noun*
1 لیلوپەری ئاوی، لاولاوەی سەرئاو [*Nymphaea lotus* و *N. caerulea* (میسر) و

ئاسیا) sacred lotus) *Nelumbo nucifera* [
2 داری کنار، نەبگ، لوتوس (بەری داریَ کە داتدەهێزرێنیَ و خەوالووت دەکا، لە چیرۆکە کۆنەکان یان میتۆلۆژی یۆنانیدا؛ بنەڕەت: بە ڕێگای لاتین لە *lōtos* یۆنانی، سامی بنەڕەت) ۞
1 نیلوفرآبی 2 درخت سدر، لوتوس

**lotus-eater** /ˈləʊtəs iːtə(r)/ *noun*
مرۆی بیَخەم، بنیادەمی بیَخەیاڵ یان لەگوێی گادانوسـتوو، نادەربەسـت، ئـالۆری، مـرۆی فربەسەردنیاوەنەبوو ۞ آدم بی‌دغدغه

**lotus position** *noun*
بار یا ڕەوشی لوتوسی (لە کاتی میدیتەیشن لە یوگادا) ۞ حالت لوتوس

**louche** /luːʃ/ *adjective*
ئابڕووبەرە، خراپ، ناحەز، دزێو، شوورەیی، شەرماوی، عەیب، بیَئابڕوو، disreputable، dubious ۞ ننگین، زشت، رسوا

**loud** /laʊd/ *adjective, adverb*
1 بەرز، بڵیند 2 پرهەراوهوریا، شلوق، پرقاوقیژ 3 بـــە زریقەوبریقـــە، ئـــالاوواڵا، زەق، سەیر(وسەمەرە؛ loudly /laʊdli/ *adv*: بە دەنگی بەرز(ەوە)؛ loudness *n*: بەرزی) ۞ 1 بلند، رسا 2 پرسر و صدا 3 زننده

**loudhailer** /ˌlaʊdˈheɪlə(r)/ *noun*, also megaphone
بڵیندگۆی دەستی ۞ بلندگوی دستی

**loudish** *adjective*
کەمیَ بەرز، بەرزیلە ۞ نسبتاً بلند

**loudmouth** /ˈlaʊdmaʊθ/ *noun*
مـرۆی دیوانـدڕ، دەمـشڕ، بەیتەشـە، دەمـدڕاو، قیژەوون ۞ آدم دهن‌دریده

**loud-mouthed** *adjective*
دیواندڕ، دەمشڕ، دەمدڕاو، بەیتەشە، قیژەوون ۞ دهن‌دریده، جیغ‌کش

**loudspeaker** /ˌlaʊdˈspiːkə(r)/ *noun*
بڵیندگۆ: *Their names were called over the loudspeaker* ۞ بلندگو

**Lou Gehrig's disease** = amyotrophic lateral sclerosis

**lough** /lɒk, lɒx, US lɑːk, lɑːx/ *noun*
گۆم، گۆماو، دەریاچە، loch = ۞ دریاچه

**louis** /ˈluːi/ *noun*, louis d'or /-ˈdɔː/, *pl.* same /ˈluːɪz/
کـۆینێکی زێـڕینی فەرەنـسی نێـوان ساڵـەکانی 1640 تا 1793 ۞ لوئی

**Louisianian** /luːˌiːzɪˈan(ə)n/ *noun, adjective*, also Louisianian /luːˌiːzɪˈanɪ(ə)n/
1 خەڵکی هەرێم یان ئەیالەتی Louisianaی ئەمریکا، لویزیانایی 2 سەربە لویزیانا، لویزیانایی ۞ لویزیانایی

**louis d'or** *noun, pl.* same
1 جۆریَ سکە یان کۆینی زێڕین کە یەکەم جار لـە 1640 لیَـدرا و تـا وەرگـۆڕانی فـەرەنـسە دەردەکرا (هەروەها louis) 2 تێکەزێڕیَ بایی 20 فرانـک کـە تـا دوای وەرگـۆڕانی فـەرەنـسەش لیَـدەدرا (بنـەڕەت: لـە نـاوی لـوئیس یـان لـوئی سێزدەیەمی فەرەنسی) ۞ لوئیز دور

**Louis Quatorze** *adjective*
سـەربـە شـێواز و تایبـەتمـەنـدی مێعمـاری و ڕازاندنەوەی نێوەوەی سەردەمی پادشایی لوئی چواردەیەم (1650 تا 1700) ۞ لوئی کوارتورز

**Louis Quinze** *adjective*
سـەربـە شـێواز و تایبـەتمـەنـدی مێعمـاری و ڕازاندنەوەی نێوەوەی سەردەمی پادشایی لوئی پازدەیەم (1720 تا 1750) ۞ لوئی کوینز

**Louis Seize** *adjective*
سـەربـە شـێواز و تایبـەتمـەنـدی مێعمـاری و ڕازاندنەوەی نێوەوەی سەردەمی پادشایی لوئی شازدەیەم (1774 تا 1795) ۞ لوئی سیز

**Louis Treize** *adjective*
سـەربـە شـێواز و تایبـەتمـەنـدی مێعمـاری و ڕازاندنەوەی نێوەوەی سەردەمی پادشایی لوئی سێزدەیەم (1600 تا 1650) ۞ لوئی ترز

**lounge** /laʊndʒ/ *noun*
1 حەسانەوە، پاڵدانەوە، پشوودان، لیَکەوتن 2 سالۆن یا هۆڵی چاوەڕیَ 3 مەیخانە 4 = sitting room ۞ 1 استراحت 2 سالن انتظار 3 میکده

**lounge bar** *noun*
مەیخانە ۞ میکده

**lounge lizard** *noun*
سـەربـاری 1 - man 2 ladies' - 3 fop - کۆمەڵگا ۞ لاونگ لیزارد

**lounger** /ˈlaʊndʒə(r)/ *noun*
1 مرۆی لەشگران و بێکارە 2 کورسی ئاسوودە ۞ 1 آدم تنەلش یا بیکاره 2 صندلی راحتی

**lounge suit** *noun*
کۆت و شەڵوار ۞ کت و شلوار

**loup** *noun*
1 (لە سکاتلەند) هەڵاتن، ڕاکردن 2 وردبینی چکۆلە ۞ 1 فرار، گریز 2 ذره‌بین کوچک

**loupe** /luːp/ *noun*
وردبینی چکۆلە، گەورەکەرەوەی چکۆلە (هی گەوهەرفرۆش و سەعاتساز) ۞ ذره‌بین کوچک

**louping-ill** /ˈlaʊpɪŋɪl/ *noun*
ئـازارێکی پاتـاڵ لـە گەنـەوە، ب.ت. مـەڕ، لەترووهەڵبەزە ۞ نوعی بیماری

**lour** /ˈlaʊə/ *noun* , also lower
1 مۆنی، مۆچی، برۆتێکنان، مڕومۆچی 2 ماتی یان داگیراوی ئاسمان ۞ 1 اخم 2 تیرگی آسمان

**louring** *adjective*
1 مۆن، برۆتێکناو، مڕومۆچ 2 داگیراو، مات ۞ 1 اخمو 2 تیره

**louringly** *adverb*
به مۆنی‌یەوە، مرومۆچانە ◌ با اخم

**loury** *adjective*
1 مۆن، بروتێکناو، مرومۆچ 2 داگیراو، مات، لێڵ ◌ 1 اخمو 2 تیره

**louse** /laʊs/ *noun, pl.* lice
1 ئەسپێ، هەپش، گنار [*Pediculus humanus* (بروانە body louse, head louse)] 2 مێش، مێشوولە [دەستەکانی Anoplura (هی خوێنمژ) و Mallophaga (هی پێوەدەر)] 3 بۆ ناوی بێبڕبڕە چکۆلە یان وردەکان بەکاردێنرێ کە دەدەنە یان دەبنە مشەخۆری گیانەوەرە ئاوی و رووەکەکان، ب.ن. fish louse 4 مرۆی سووک، بنیادەمی خوێڕی (ئەڵمانی بنەڕەت) ◌ 1 شپش 2 شته 3 آدم رذیل 3 و 4 لوس

**louse fly** *noun*
مێشەئەسپێ [خێزان Hippoboscidae: زۆر جۆرن] ◌ لوس فلای

**louser** *noun*
(نافەرمی، زۆرتر ئیرلەندی) مرۆی سووک یا خوێڕی ◌ آدم پست

**lousewort** /'laʊswɜːt/ *noun*
(رووەکناسی) گیائەسپێ؟ (چەندین جوری هەیە [توخم *Pedicularis*: چەندین جۆرن]) ◌ نوعی گیاه

**lousy** /'laʊzi/ *adjective* (lousier, lousiest)
1 ئەسپێون، زۆن، رشکن، کۆلەئەسپێ، چڵکن، هەپشاوی 2 خراپ، ناخۆش، پیس، پڕ، تەنراو ◌ 1 شپشو 2 مزخرف، پر

**lout** /laʊt/ *noun*
لات، بەرەڵا، زلحیز، کەلەگا ◌ لات

**loutish** /'laʊtɪʃ/ *adjective*
وەکوو لات، لاتئاسا، لاتانە: *loutish behaviour* ◌ مانند لات‌ها

**loutishly** /'laʊtɪʃli/ *adverb*
وەکوو لات، لاتانە ◌ مثل لات‌ها

**loutishness** /'laʊtɪʃnəs/ *noun*
لاتی‌گەری، زلحیزی، کەلەگایی ◌ لاتی‌گری

**louvar** /'luːvɑː/ *noun*
ماسی‌یەسەرزلە، ماسی‌یەسەرکەر [*Luvarus imperialis*] ◌ نوعی ماهی

**louvre** /'luːvə(r)/ *noun*, US also louver
1 بابوێر، لوڤر، خەفەنگ (ب.ت. ئەگەر پەرەپەرە بێ، بۆ دەرچوونی دووکەڵ یان تێکەوتنی رۆشنایی) 2 گومەزی کونکون یان دەلاقەدار ◌ 1 کرکره 2 گنبد روزنه‌دار

**louvred** *adjective*
بابوێردار، لوڤرید، خەفەنگی، دەرابەیی، خەفەنگ‌دار ◌ کرکره‌ای

**lovability** /ˌlʌvə'bɪləti/ *noun*, also -ableness
لەبەردڵانی، جوانی، شیرینی، ژیکەڵەیی، سەرنجڕاکێشی ◌ جذاب

**lovable** /'lʌvəbl/ *adjective*, also loveable
لەبەردڵان، خۆشەویست، جوان، شیرین، نازەنین، خوێنشیرین، ژیکەڵە، سەرنجڕاکێش: *a lovable child* ◌ دوست‌داشتنی، جذاب

**lovage** /'lʌvɪdʒ/ *noun*, also hart-wort
(رووەکناسی) سوولان؟، کاخلی بەهارە؟، شەماڵگیر؟: رووەکێکی گوڵسپی، لە تیرەی parsley (هی مەدیتەرانە) [*Levisticum officinale*] و جۆرەکانی تر] ◌ انجدان رومی

**love** /lʌv/ *noun*
1 خۆشەویستی، ئەڤین، مەیر، عیشق، عەشق، دلداری، دڵتێچوون، دڵبەستەیی 2 گراو، یار، خۆشەویست 3 (لە بانگکردنا) خۆشەویستم، ئازیزەکەم، دڵی من 4 (تێنیس، سکواش و هتد) هیچ، بێخاڵ 5 نزیکی، هاوجێیی، سەرجێیی 6 شتی جوان 7 (Love) خوازنی ئەڤین یان خۆشەویستی (وەک Cupid خوای رۆمی) ◌ 1 عشق، محبت 2 معشوق 3 عزیزم 4 صفر 5 هم‌خوابگی 6 چیز قشنگ 7 الهه‌ی عشق

**loveable** = lovable

**love-affair** *noun*
پێوەندی سێکسی یان دلدارانە ◌ رابطه‌ی عشقی یا جنسی

**love apple** = tomato (archaic)

**lovebird** /'lʌvbɜːd, US -bɜːrd/ *noun*
1 تووتی ئەمریکایی [توخم *Agapornis*: چەندین جۆرن] 2 (نافەرمی، lovebirds) ئاشقە و ماشقە، دڵپێکبەستوو(ان) ◌ 1 طوطی عشق 2 (در جمع) عاشق و معشوق

**love bite** *noun*
ژیپکە ◌ جوش

**love-begotten** /'lʌvbɪɡɒtn/ *adjective*
زۆڵ، بیژوو، حەرامزادە ◌ نامشروع، حرام‌زاده

**love-child** /'lʌv tʃaɪld/ *noun*
منالی زۆڵ، زارۆکی بیژوو ◌ بچه‌ی نامشروع

**love-game** *noun*
(تەنیس، سکواش و...) یارییێ کە لەودا دۆڕاوەکە هیچ خاڵێ ناباتەوە ◌ لاو گیم

**love-hate relationship** *noun*
پێوەندی یا هەستی خۆشەویستی و رقلێبوون، تێکەڵەیێ لە خۆشەویستی و رق، پێوەندی دۆستایەتی و دوژمنی ◌ احساس عشق و نفرت

**love-in-a-mist** /'lʌv ɪn ə'mɪst/ *noun*
رووەکێ لە تیرەی buttercup [*Nigella damascena*] ◌ گل شودی

**loveless** /'lʌvləs/ *adjective*
بێ‌ئەڤین، بێ‌دلداری، بێ‌خۆشەویست، خۆشەویستی‌نەچێشتوو، ساردوسڕ، بێ‌دڵ: *a loveless marriage* ◌ بدون عشق، بی‌عاطفه

**loveless marriage** *noun*

ژن‌ومێردایەتی بێ‌دڵداری، زەماوەندی بێ‌دڵداری ◌ ازدواج بدون عشق
**loveless relationship** *noun*
پێوەندی بێ‌دڵداری ◌ رابطەی بدون عشق
**love-letter** /ˈlʌv letə(r)/ *noun*
نامەی دلداری ◌ نامەی عاشقانە
**love-lies-bleeding** *noun*
رووەکێکی ئەمریکای باشووری [ *Amaranthus caudatus*] ◌ نوعی گیاه
**love life** *noun*
ژیانی دلداری یان ئەویندارى (و سێکسی) ◌ زندگی عشقی
**loveliness** /ˈlʌvlinəs/ *noun*
جـوانی، دلـرفێنی، چەلـەنگی، رنـدی، سەرنج‌ڕاکێشی ◌ زیبایی، جذابیت
**lovelock** /ˈlʌvlɒk/ *noun*
(کۆن) فۆکلە، کاکوڵ، ئەگریجە، لاجانگ ◌ زلف
**lovelorn** /ˈlʌvlɔːn, US -lɔːrn/ *noun*
(عاشق) دڵشکاو، دڵسووتاو، دڵبریندار، گرفتار (یان گیرۆدە) بە خەمی دووری، دڵتەنگی ئیشق ◌ دلسوخته
**lovely** /ˈlʌvli/ *adjective* (lovelier, loveliest), *noun* (*pl.* lovelies)
*adj* جـوان، رنـد، چەلـەنگ، دڵـرفێن، شـیرین، نـازەنین، سـەرنج‌ڕاکـێش، خـۆش، لەبـەردڵان، خۆشەویـست، جـوان، ژێکەلـە *n* کـچ یـان ژنی جـوان ◌ *adj* زیبـا، جـذاب، خوشـایند، دوست‌داشتنی *n* دختر یا زن زیبا
**lovemaking** /ˈlʌvmeɪkɪŋ/ *noun*
1 عیـشق‌بـازی، دلـداری 2 نزیکـی، هـاوجێیی، سەرجێیی ◌ 1 عشق‌بازی 2 هم‌خوابگی، مقاربت
**love-match** /ˈlʌv mætʃ/ *noun*
ژن‌ومێردایەتی لەبەر دلداری یا خۆشەویستی ◌ زناشویی به خاطر عشق
**love nest** *noun*
(نافەرمی) داو یـان تەڵـەی ئـەوین (دڵداری) ◌ دام عشق
**love-potion** *noun*
دەرمانی ئیشق یان دلداری ◌ معجون عشق
**love-philtre** = love-potion
**lover** /ˈlʌvə(r)/ *noun*
1 شـێت‌وشـەیدا، شـەیـدا، دڵبەسـتە، دڵ‌تێچـوو، ئەودال، ئاشق، عاشق، دڵدار، ئەڤیندار، گراو، 2 *He denied that he was her lover* : یار (lovers) ئاشـقە و ماشـقە ◌ 1 شـیفته، عاشـق، معشـوق 2 (در جمع) عاشق و معشوق
**love scene** *noun*
دیمەنی دلدارانە یان سێکسی ◌ صحنەی عشقی
**love-seat** *noun*
سۆفای دووکەسە ◌ مبل دونفره
**lovesick** /ˈlʌvsɪk/ *adjective*
نەخۆش یان خولیای ئەوین (دڵداری)، شەیدای ئەڤین ◌ بیمار عشق
**lovesickness** /ˈlʌvsɪknəs/ *noun*
نەخۆشـی یـان خولیـایی ئـەوین (دڵـداری)، شەیدایی ئەڤین ◌ بیماری عشق
**lovesome** /ˈlʌvsəm/ *adjective*
(ویـژەیـی) خۆشەویـست، نـازەنین، لەبـەردڵان، جـوان، affectionate ،lovely ،winsome، amorous ◌ محبوب، زیبا
**love-song** /ˈlʌv sɒŋ/ *noun*
گۆرانی دلداری ◌ ترانەی عاشقانە
**love-story** *noun*
داستان یان چیرۆکی دلداری ◌ داستان عاشقانه
**love-token** *noun*
نیشانە یان یادگاری دلداری، نیشانی دلداری ◌ نشان عشق
**lovey-dovey** *adjective*
(نافـەرمی) دلـدارانە، ئەویندارانە، خۆشەویستانە (lovey-doveyness *n*) ◌ عاشقانه
**loving** /ˈlʌvɪŋ/ *adjective*
دلـدارانە، ئەڤـیندارانە، خۆشەویـستانە، tender، *a warm and loving family* :affectionate ◌ عاشقانه، بامحبت
**loving-cup** *noun*
جـامی (مـەی) دەس‌بـەدەس(کـردوو)، جـامی خۆشەویستی ◌ ساغر گردان
**loving kindness** *noun*
دڵسۆزی دلدارانە ◌ مهربانی عاشقانه
**lovingly** /ˈlʌvɪŋli/ *adverb*
دلـدارانە، لـە رووی دلـداری(یـەوە)، لـە رووی خۆشەویستییەوە: *He gazed lovingly at his children* ◌ با محبت، از روی عشق
**low**[1] /ləʊ, US loʊ/ *adjective* (lower, lowest), *adverb*, *noun*
1 کورت، کوڵ، قوڵـە، کـەم‌قـووڵ، بن‌دیـار، نزم، نەوی، نیـنگ 2 رۆچوو، نیشتوو، داتەپیو، داچوو، نغرۆ 3 (تـۆپ و هتـد) خـشکەیی، نەوی، نزم 4 سـووک، بەسـت، چـروک، خوێـری 5 کـەم، لـە خوار 6 بۆر 7 (نەخۆشی) سـووک 8 کز، بێ‌بنگە، لاواز 9 دڵتەنگ، خەمبار، کز، مات 10 کەوتوو، بە عەرزاکەوتوو 11 کەم‌بایەخ، بێ‌نرخ 12 (گێـر) خـوارتر 13 بـێ‌ڕەوشـت، هـەرزە 14 هـەرزان، کەمبایی 15 (ملـوان) شۆڕ، کراوە، کرابێتەوە 16 (بیۆلۆژی) سـەرەتایی 17 (دەنگناسـی) کراوە، کەوتوو 18 لـە خـوارەوە، خـوارەوە 19 هێدی، هێواش، لەسەرەخۆ، بە ئەسپایی 20 هەرزان، کەم *n* 1 کەم‌ترین ئاست یان رادە، نزم‌ترین ئاست 2 زەوی نزم 3 گێـری یـەک ◌ 1 کوتـاه، کـم‌ژرفـا، پایین، پست 2 فرورفته 3 زمینی 4 فرومایه 5 کم 6 بم 7 خفیـف 8 ضـعیف 9 افـسرده 10 افتـاده 11 بی‌ارزش 12 (دنده) سنگین 13 بی‌نزاکت 14 ارزان

15 (يقه) باز 16 ابتدايي 17 باز 18 پايين 19 ارزان 20 آهسته *n* 1 سطح كم 2 زمين پست 3 دنده يک

**low²** /ləʊ, US loʊ/ *noun*

(دەنگی مانگا) بۆره، ما ◌ ماغ، مو، ما

**low beam** *noun*

چرای خوارەوه، شەوقی خوارەوه ◌ چراغ پايين

**lowborn** /ˌləʊbɔːn/ *adjective*

نارەسەن، سووک، لە چينی خوارووی كۆمەڵ(گا)، لە خێزانی فەقیر يان نزم ◌ بداصل، از طبقەی پايين جامعه

**lowboy** /ˈləʊbɔɪ/ *noun*

(ئەمريكا) ميز يان دۆلابی كەشەودار ◌ چهارپايەی كشودار

**lowbred** /ˌləʊˈbred/ *adjective*

رەوشتنزم، بێشەرم، بێڕەوشت، نزم، تەربيەتنەدراو، سووک ◌ بی‌نزاكت، پست

**lowbrow** /ˈləʊbraʊ, US ˈloʊ-/ *noun, adjective*

*n* مرۆی بيرنزم، بنيادەمی نارۆشنبير *adj* ئاسايی، بازاڕی: *lowbrow newspapers* ◌ *n* آدم بی‌فرهنگ *adj* معمولی

**low-calorie** *adjective*

كەمگەرموكە، كەمكالۆری ◌ دارای كالری پايين

**Low Church** *noun*

كلێسەی نزم (بەشێ لە كلێسەی ئینگلتەرە كە گرنگی كەم دەدا بە سروتەكان و دەسەڵاتی قەشە و سەرقەشەكان) ◌ لو چرچ

**Low Churchman** *noun, pl.* Low Churchmen

ئەندامی يان لايەنگری كلێسەی نزم ◌ عضو يا طرفدار لو چرچ

**low class** *adjective*

1 لە يان سەربە چينی خوارووی كۆمەڵ 2 ئايەخ، بازاڕی، رەشۆكی، خراپ، گەنوگووزاڵ ◌ 1 از طبقەی پايين جامعه 2 بنجل، آشغال

**low comedy** *noun*

كۆميدی سووک ◌ كمدی جلف

**low-cost** /ˌləʊˈkɒst US kɔːst/ *adjective*

هەرزان، هەرزانبايی ◌ ارزان

**low-cut** /ˌləʊ ˈkʌt/ *adjective*

(جلی ژنان) يەخەشۆڕ، مليوانشۆڕ (مل و سەرسنگی ديار بێ) ◌ دكلته

**low-density lipoprotein** *noun, abbreviation* LDL, also bad cholesterol

كۆليسترۆلی خراپ يان بەزيان: پرۆتئينێكی پلازما كە هەڵگری سەرەكی كۆليسترۆلی نێو خوێنە، ريژەی زۆری لە خوێندا ئەگەری atherosclerosis لێ دەكەوێتەوه (بڕوانە HDL) ◌ لودنسيتی پروتئين، كلسترول مضر

**low-down** /ˈləʊdaʊn/ *adjective, noun*

*adj* سووک، چرووک، خوێڕی، نزم: *a low-down dirty liar* *n* بنج و بناوانی كێشە ◌ *adj* رذيل، فرومايه، پست *n* ته و توی قضيه

**lower** /ˈləʊə(r), US ˈloʊ-/ *adjective, comparative of low¹*

1 ژێروو، خواروو، ژێرين، بنەوه، خوارتر، نزمتر، ژێرەوه، كەم، كەمتر 2 هەرزانتر 3 (زۆرتر Lower زەوی‌ناسی و شوێنەوارناسی) كۆنتر، پێشووتر، زووتر، پێشتر، خواروو، پيرتر، ژێروو، خوارتر: *Lower Cretaceous* *Lower Paleolithic* 4 (لە ناوی شوێن‌دا) هەڵكەوتوو لە باشوور يان خوارووا، باشووری، southern: *lower New York State* ◌ 1 زيرين، زيری، تحتانی، سفلی، فروتر، پايين، پايين‌تر، كم، كمتر 2 نازل‌تر 3 سفلی 4 لوور

**lower animals** *noun, pl.*

گيانەوەرانی بێبڕبڕه ◌ جانوران بی‌مهره

**lower case** *noun,* also lowercase

پيتە چكۆلەكان (وەک *g* و *b* لە چاو G يان B) ◌ حروف كوچک

**Lower Chamber** = Lower House

**lower class** *noun, adjective*

*n* 1 چينی خوارووی كۆمەڵگا) 2 چينی كريكار *adj* سەربە چينی كريكار ◌ *n* 1 طبقەی پايين 2 طبقەی كارگر *adj* وابسته به طبقەی كارگر

**lower criticism** = textual criticism

**the lower deck** *noun*

ئەفسەرە پايەنزمەكانی هێزی دەريايی ◌ درجه‌داران

**Lower House** *noun*

1 (لە بريتانيا) ئەنجومەنی هەڵنەبژێراوان يان ژێرين 2 (لە ئەمريكا) ئەنجومەنی نوێنەران ◌ 1 مجلس عوام 2 مجلس نمايندگان

**lowermost** /ˈləʊəməʊst/ *adjective*

كەمترين، نزمترين، خوارترين، ژێرترين ◌ كمترين، پايين‌ترين

**lower plants** *noun, pl.*

قەوزەیی‌يەكان، گيا نزمەكان ◌ گياهان پست

**lower regions** *noun, pl.*

(كۆن) دۆزەخ، جەهەنم ◌ دوزخ

**lowest common denominator** *noun*

(بيركاری) چكۆلەترين ژێرەی هاوبەش ◌ كوچک‌ترين مخرج مشترک

**low-fat** *adjective*

كەمچەوری ◌ كم‌چربی

**low-flying** *adjective*

(فڕۆكە، باڵندە و هتد) نزمەفڕ ◌ كوتاه‌پرواز

**low frequency** *noun, abbreviation* LF

لەرەی نزم (يان كەم، لە نێوان 30 تا 300 كيلۆهێرتز) ◌ بسامد پايين

**low gear** *noun*

گێری كەم يان خوارتر، دەندەی خوارتر ◌

دندەی سنگین

**Low German** *noun*
ئەڵمانی باکووری یان خواروو: زاراوەیێکی ئەڵمانی کە لە زۆربەی ئەڵمانیای باکووری قسەی پێدەکرێ ◌ آلمانی شمالی

**low-grade** *adjective*
خراپ، ئایەخ، بازاڕی، گەنوگووزاڵ، رەشۆکی، رەشۆک ◌ نامرغوب

**low-key** *adjective*
ئاسایی، سادە، بێ کەشخە و ژاژوفەڕ، بێدیدیوبۆدی، بێداب‌وناب، بێداب‌ودەستوور، نە بە جۆش‌وخرۆش: *Their wedding was a very low-key affair* ◌ معمولی، بدون کبکبه

**low-keyed** = low-key

**lowland** /ˈləʊlənd, US ˈloʊ-/ *noun*
(هەروەها lowlands) زەوی نزم، دەشت، نزمەزەوی، دۆڕ، زەوی قووڵ، دەشتایی، نزمایی ◌ زمین پست، فرویوم

**lowlander** /ˈləʊləndə(r), US ˈloʊ-/ *noun*
1 دانیشتووی دەشتایی یان زەوییە نزمەکان، دۆڕنشین، دەشت‌نشین، دانیشتووی نزمایی‌یەکان 2 (Lowlander) دەشت‌نشین، دانیشتووی زەوییە نزمەکانی سکاتلەند ◌ 1 ساکن زمین‌های پست 2 (با L) بومیان زمین‌های پست اسکاتلند

**Low Latin** *noun*
شێوەکانی سەدەکانی نێوەڕاست و دواتری لاتین ◌ لو لاتین

**low-level** *adjective*
لە ئاستێکی نزمدا، ئاست‌نزم ◌ در سطح پایین

**low-level language** *noun*
(کامپیوتێر) زمانی ئاستی نزم ◌ زبان سطح پایین

**low life** *noun*
ژیانی سەربە چینەکانی خوارووی کۆمەڵگا، تاوانکار، خراپکار ◌ زندگی متعلق بە طبقات پایین جامعه، خلاف‌کار

**lowlight** *noun*
(نافەرمی) ڕووداوی دڵساردکەرەوە ◌ رویداد ناامیدکننده

**lowliness** /ˈləʊlinəs, US ˈloʊlinəs/ *noun*
سووکی، چرووکی، پەستی، سەرکزی، نزمی ◌ پستی، حقارت

**low-loader** *noun*
باننزم (ماشێن و بێ‌لا (یان باخڵ)، بۆ بارکردنی شتی قورس) ◌ لولودر

**lowly** /ˈləʊli, US ˈloʊli/ *adjective* (lowlier, lowliest), *adverb*
*adj* پایەنزم، پایەپەست، نزم، سەرکز، سادە: *a -y government clerk* *adv* لە ڕووی سووکی‌یەوە ◌ *adj* دون‌پایه، بی‌تکلف *adv* از روی پستی

**low-lying** *adjective*
نزم، کەم‌بەرز، نزیک ئاستی دەریا، خوارتر یان نزم‌تر لە ئاستی دەریا ◌ پست، نزدیک سطح دریا

**Low Mass** *noun*
شێوی خواوەندی سادە (بێ‌موسیقا و کەم‌ترین ڕێوڕەسم) ◌ عشا ربانی ساده

**low-minded** *adjective*
بیرنزم، بێ‌ڕەوشت، سووک‌وچرووک، نزم، هەرزە ◌ بی‌فرهنگ

**low-mindedness** *noun*
بیرنزمی، بێ‌ڕەوشتی، نزمی، هەرزەیی ◌ بی‌فرهنگی

**low-necked** /ˌləʊ ˈnekt/ *adjective*
(جلی ژنان) یەخەشۆڕ ◌ دکلته

**lowness** /ˈləʊnəs/ *noun*
نزمی، سووکی، چرووکی، خوێڕیەتی، هێواشی، ئارامی ◌ پستی، فرومایگی، آهستگی

**low-pitched** /ˈləʊ pɪtʃt/ *adjective*
1 (دەنگ) بۆڕ: *a low-pitched voice* 2 نەرم، ئارام، هێدی 3 (سەربان) ڕاست، کەم‌لێژ، بڕێلاپێ ◌ 1 بم 2 ملایم 3 (بام) کم‌شیب

**low pitched roof** *noun*
سەربانی ڕاست یان کەم‌لێژ ◌ بام کم‌شیب

**low point** *noun*
خراپ‌ترین یا ناخۆش‌ترین بەش ◌ بدترین قسمت

**low profile** *noun*, keep a low profile
دەرنەکەوتن، خۆپیشان‌نەدان، دەرەوەنەهاتن ◌ دور از انظار

**low pressure** /ˈləʊ preʃə(r)/ *noun*
گوشار یان پاڵەپەستۆی کەم، پەستانی کەم یان نزم ◌ فشار کم

**low-rise** *adjective*
(خانووبەرە) دوو سێ نهۆم، نزم ◌ کم‌ارتفاع

**low-risk** *adjective*
کەم‌مەترسی، بە مەترسی‌یەکی کەمەوە ◌ دارای خطر کم

**low season** *noun*
وەرزی ناتوریستی یا ناپشوو (یان پشووتیانەبوو، بەشێ لە ساڵ کە کەم‌ترین توریست یا سەردانکەر بۆ شوێنێ دەچن) ◌ فصل غیرتوریستی

**low-slung** *adjective*
(ماشێنی وەرزشی) نزم ◌ لوسلانگ

**low spirits** *noun, pl.*
دڵتەنگی، ماتی، کزی، خەمباری ◌ افسردگی، غمگینی

**low-spirited** /ˈləʊ ˈspɪrɪtɪd/ *adjective*
دڵتەنگ، مات، کز، خەمبار ◌ افسرده، غمگین

**low-spiritedness** *noun*
دڵتەنگی، ماتی، خەمباری ◌ افسردگی، غمگینی

**Low Sunday** *noun*
یەکشەممەی دوای Easter ◌ یکشنبه‌ی بعد عید پاک

**low-tech** *adjective*

تیک‌نزم، سەرەتایی، بە تیکنولۆژی سەرەتاییەوە ◌ دارای فناوری ابتدایی

**low technology** *noun*
تیکنولۆژی سەرەتایی یان کەم‌پێشکەوتوو ◌ فناوری ابتدایی

**low tide** *noun*, also low water
کشاو، ئاوداکشان، نیشتاو ◌ فروکشند

**low-water mark** *noun*
1 هێلی نیشتاو 2 نزم‌ترین رادە، خراپ‌ترین رادە یان بارودۆخ ◌ 1 خط جزر 2 پایین‌ترین حد

**Low Week** *noun*
حەوتووی Low Sunday ◌ هفتەی Low Sunday

**lox**[1] /lɒks, US lɑːks/ *noun*
ئۆکسیژینی شلە ◌ اکسیژن مایع

**lox**[2] /lɒks, US lɑːks/ *noun*
سەلموونی خوێ‌پێوەکراو یان لە خوێاوکدا هەلگیراو و جاروبار دووکەڵدراو: *a bagel with cream cheese and lox* ◌ ماهی آزاد بودادە

**loxodrome** /ˈlɒksədrəʊm/ = rhumb1

**loxodromic** /ˌlɒksəˈdrɒmɪk/ *adjective*
سەربە rhumb1 ◌ وابستە بە rhumb1

**loyal** /ˈlɔɪəl/ *adjective*
بەوەفا، وەفادار، بەئەمەک، ئەمەگدار، دڵسۆز، جگەرسۆز، سەرراست، سەرراستانە، بەئەمەکانە ◌ وفادار، صادق، وفادارانە

**loyalism** /ˈlɔɪəlɪzəm/ *noun*
لایەنگری لە حکومەت، دڵسۆزی، بەوەفایی، بەئەمەکی، ئەمەگداری ◌ طرفداری از حکومکت، وفاداری

**loyalist** /ˈlɔɪəlɪst/ *noun, adjective*
1 لایەنگری حکومەت یان تاج‌وتەخت، دڵسۆز، بەوەفا، بەئەمەک (ب.ت. بە حکومەتی سەردەمی خۆی) 2 (Loyalist) لایەنگری یەکێتی نێوان بریتانیای گەورە و ئیرلەندی باکووری ◌ 1 طرفدار حکومت، وفادار 2 طرفدار اتحاد بریتانیای کبیر و ایرلند شمالی

**loyally** /ˈlɔɪəli/ *adverb*
بەوەفایانە، ئەمەکدارانە، دڵسۆزانە، سەرراستانە ◌ وفادارانە، صادقانە، با اخلاص

**loyalty** /ˈlɔɪəlti/ *noun, pl.* loyalties
بەئەمەکی، دڵسۆزی، بەوەفایی، سفەت ◌ وفاداری

**lozenge** /ˈlɒzɪndʒ, US ˈlɑːz-/ *noun*
1 لەبزینە، شێوەی ئەڵماس 2 حەبی مژین (بە شێوەی لەبزینە) ◌ 1 لوزی 2 قرص مکیدنی

**LP** /ˌel ˈpiː/ *abbreviation* long-playing

**L-plate** *noun*
(لە بریتانیا) تابلۆی مەشق‌بین ◌ تابلوی تحت آموزش رانندگی

**LPN** /ˌel piː ˈen/ *abbreviation* licensed practical nurse

**LSD** /ˌel es ˈdiː/ *abbreviation German Lysergsäure-Diäthylamid* (lysergic acid diethylamide)
ئێل‌ئێس‌دی: جۆرێ دەرمان یان ئاوێتەیێکی ئەندامی ناقانوونی نیمچەدەسکرد semisynthetic ی هالوسینۆژێنیک $C_{20}H_{25}N_3O$، هەلوەسەی کاتی temporary hallucination و دۆخێکی دەروونشێواو psychotic پێکدێنێ؛ هەروەها (lysergic acid diethulamide ◌ ال‌اس‌دی

**LST** /ˌel es ˈtiː/ *abbreviation* Local Standard Time

**Lt** *abbreviation* Lieutenant

**LTA** *abbreviation* Lawn Tennis Association
(لە بریتانیا) کۆمەڵەی تێنیس ◌ انجمن تنیس

**Ltd** *abbreviation* limited

**Lu** symb. the chemical element lutecium

**luau** /ˈluːaʊ/ *noun, pl.* same or luaus
میوانی یان جەژنی هاوایی‌یەکان (بنەرەت: لە *lu'au* هاواییایی) ◌ پارتی یا عید هاوایی‌ها

**Lubavitcher** *noun, adjective*
*n* ئەندامی تیرەیێکی دینی Hasidic لە لایەن Schneour Zalman ی Lyady لە دواییەکانی سەدەی هەژدەدا دامەزرا *adj* سەربە Lubavitcher (بنەرەت: لە ناوی شاری Lyubavitsh ی بێلاڕووس Belarus) ◌ لوباویتچر

**lubber** /ˈlʌbə(r)/ *noun*
1 مەلەوانی تازەکار یان ناشارەزا 2 مرۆی گەوج(ولەوج)، زلی بێ‌هونەر ◌ 1 ملوان غیرماهر 2 آدم احمق، لندهور

**lubber line** *noun*
هێلی راست یا ئەستوونی سەر لادۆز ◌ خط عمودی روی قطب‌نما

**lubberliress** /ˈlʌbə(r)linəs/ *noun*
گەوجێتی، کەرێتی، دەبەنگی ◌ حماقت، کودنی

**lubberly** /ˈlʌbə(r)li/ *adverb*
کەرانە، گەوجانە ◌ احمقانە

**lube** /luːb/ = lubricant

**lubric** = lubricious (archaic), lubrical *adj*

**lubricant** /ˈluːbrɪkənt/ *noun, adjective*
*n* 1 رۆن، چەوری، ماسلە، گریس 2 رەوانکەر، نەرم‌کەر، شتێ کە بەر لە کێشە و ململانێ دەگرێ: *adj a social -ricant* رەوانکەر، نەرم‌کەر، چەورکەر ◌ *n* 1 روغن، گریس 2 لوبریکانت *adj* روان‌سازندە، لینت‌دهندە

**lubrication** /ˌluːbrɪˈkeɪʃn/ *noun*
1 نەرم‌کردن، چەورکردن، چەورکاری، ماسلەکاری، گریس‌کاری، رۆنکاری 2 رەوانکاری، رەوانکردن، نەرم‌کردن ◌ 1 روغن‌کاری، لیزکردن 2 روان‌سازی

**lubricator** *noun*
رۆندان، چەوری‌دان، رۆن‌تێکەر ◌ روغن‌دان

**lubricity** /lu:'brɪsɪtɪ/ *noun*

چەوری، خزی، رەوانی، نەرمی ◇ چربی، لیزی

**lubricious** /lu:'brɪʃəs/ *adjective*, also lubricous /'lu:brɪkəs/

1 بەناڵۆش، هەوەسباوی، زەنەک، ئاورگرتوو، هەرزە، بەناڵوشانە 2 خز، رەوان، نەرم ◇ 1 شهوت‌پرست، شهوت‌پرستانه 2 لیز

**lubriciously** /lu:'brɪʃəslɪ/ *adverb*

بەناڵوشانە، بە شێوەیەکی هەوەسباوی ◇ شهوت‌پرستانه

**lubritorium** *noun*

شوێنی چەورکردن، چاڵی گریس‌کاری ◇ محل گریس‌کاری

**Lucan** /'lu:k(ə)n/ *adjective*

سەربە سەینت Luke ◇ وابسته به لوقا

**Lucayo** *noun*, also Lucayan

ئەندامی گەلێکی Arawakan ی Bahamas ◇ لوکایو

**luce** /'lu:s/ *noun*, *pl.* same

ماسی pike، ب.ت. هەراشەکەی ◇ نوعی ماهی

**lucency** /'lu:s(ə)ntsɪ/ *noun*

1 پرشنگ‌دانەوە، درەوشانەوە، رووناکی‌دانەوە 2 روونی، رۆشنی، رووتەنکی ◇ 1 درخشندگی، سطوع 2 شفافی

**lucent** /'lu:s(ə)nt/ *adjective*

1 پرشنگ‌دار، درەوشاوە، رووناک: luminous 2 روون، رۆشن، رووتەنک ( lucently /'lu:s(ə)ntlɪ/ *adv*) ◇ 1 درخشان، ساطع 2 شفاف

**lucerne** /lu:'sə:n/ *noun*, also alfalfa

(رووەکناسی) وێنجە، هەڵز، کەت، قەت، زەرەکە (وێنجەکێویلە، هەسپک، هەسپست wild lucerne) ◇ یونجه

**lucid** /'lu:sɪd/ *adjective*

1 روون، رۆشن، ئاشکراو، دیار، بە ئاسانی لێ‌تێگەیشتوو، ئاسان: a lucid style/explanation 2 ژیرانە، ژیر، ئاقڵ، وریا، ئاقڵانە، عاقڵانە 3 ساغ، سەلامەت 4 روون، رووناک، درەوشاوە، بریقەدار، پرشنگ‌دار ◇ 1 واضح، قابل فهم 2 معقول، عاقل 3 سالم 4 شفاف، براق، درخشان

**lucidity** /lu:'sɪdətɪ/ *noun*, also lucidness

1 روونی، رۆشنی، دیاری، ئاشکرایی 2 سەلامەتی، ساغی 3 درەوشانەوە، بریقەدانەوە، پرشنگ‌دانەوە ◇ 1 وضوح 2 سلامتی 3 درخشش، شفافیت

**lucidly** /'lu:sɪdlɪ/ *adverb*

بە روونی، بە ئاشکرایی ◇ به وضوح

**Lucifer** /'lu:sɪfə(r)/ *noun*, also the Devil

1 شەیتان the Devil 2 ئەستێرەی بەیانی یان رۆژی، کاروان‌کوژ 3 (وێژەیی) هەسارەی Venus لە بەیانیدا 4 (کۆن lucifer) شەمچە، گوگرد (Luciferian *adj*) ◇ 1 شیطان 2 ستارەی صبح 3 زهره 4 (با l) کبریت

**luciferase** *noun*

لوسیفێراز: هەوێنەیێ کە هانی ئۆکسان(دن)ی luciferin دەدا ◇ لوسیفراس

**luciferin** *noun*

لوسیفێرین: هەریەک لەو ماکە ئەندامییە جۆراوجۆرانەی بوونەوەرە درەوشاوەکان کە رووناکییێکی بێ‌گەرما بەرهەم دێنێ (وەک firefly) ◇ لوسیفرین

**luciferous** *adjective*

درەوشاوە، رووناک، پرشەوق، ترووسکەدار ◇ درخشان، نورافشان

**Lucina** *noun*, Latin

1 لوسینا: خواژنی منداڵبوون لە میتۆلۆژی رۆمیدا 2 = midwife ◇ لوسینا

**luck** /lʌk/ *noun*

بەخت، شانس، هات، بەختەوەری، هات‌ونەهاتی، بەختیاری، ناوچاوان‌هێناوی، بەخت‌بەرزی، بەخت‌رووتێ‌کردوویی، بەخت‌باشی، سەرکەوتن ◇ اقبال، بخت، خوش‌اقبالی، موفقیت

**luckily** /'lʌkɪlɪ/ *adverb*

بە خۆشی(یەوە)، بەختەوەرانە ◇ خوش‌بختانه

**luckiness** /'lʌkinəs/ *noun*

بەختەوەری، بەختیاری، بەبەختی، ناوچاوان‌هێناوی ◇ خوش‌بختی

**luckless** /'lʌkləs/ *adjective*

بەخت‌رەش، بەوبەخت، بێ‌بەخت، نگریس، بێ‌ودم، بەدشووم، ناسەرکەوتوو، فشەڵ ◇ بدبخت، منحوس، ناموفق

**lucky** /'lʌki/ *adjective* (luckier, luckiest)

بەختەوەر، بەخت‌بەرز، بەختیار، خۆش‌بەخت، بەخت‌رووتێ‌کردوو، ناوچاوان‌هێناو، سەرکەوتوو، پێ‌وقەدەم‌باش، بەودم، بەهات، مەبارەک ◇ خوش‌بخت، خوش‌اقبال، موفق، خوش‌قدم

**lucky bag** = grab bag

**lucky dip** *noun*

توورەکەی بەخت ◇ کیسەی شانس

**lucrative** /'lu:krətɪv/ *adjective*

خێردەرەوە، سەربەقازانج، بەقازانج، بەخێر، پرداهات ◇ سودآور

**lucratively** /'lu:krətɪvlɪ/ *adverb*

بە شێوەیێکی خێردەرەوە، بەقازانجانە، پرداهاتانە ◇ به طور سودآور

**lucrativeness** /'lu:krətɪvnəs/ *noun*

خێردەرەوەیی، بەقازانجی، بەخێری، پرداهاتی ◇ سودآوری

**lucre** /'lu:kə(r)/ *noun*

(وێژەیی) پارە، پووڵ، سامان، ماڵ ◇ پول، ثروت

**lucubration** /ˌlu:kjʊ'breɪʃn/ *noun*

1 (فەرمی) لێکۆڵینەوە، خوێندنەوە، پەیجوری،

(تێ)ڕامان، بیرکردنەوە، قووڵبوونەوە 2 پارچە نووسراوەیێکی پڕهونەری 3 شەونخوونی (لەبەر چرادا) ◌ 1 مطالعە، تعمق 2 لوکوبراسیون 3 ریاضت

**lucubrator** *noun*

شەونخوونیکێش، زەحمەتکێش ◌ ریاضتکش

**luculent** /'lu:kjʊl(ə)nt/ *adjective*

(دەگمەن) ڕوون، دیار، ئاشکرا، خویا، لەبەرچاو ◌ واضح، آشکار

**luculently** /'lu:kjʊl(ə)ntli/ *adverb*

بە ڕوون، بە شێوەیێکی ئاشکرا ◌ به وضوح

**Lucullan** *adjective*, also Lucullian

1 سەربە Licinius Lucullus کونسولی دەوڵەمەندی ڕۆمی کۆن کە ناوی هەبوو بۆ بەزم و میوانی شایانەی 2 = lavish ،luxurious ◌ لوکولان

**Luddite** /'lʌdaɪt/ *noun, adjective,* also technophobe

1 ئەندامی دارودەستەی کرێکارانی ئینگلتەرەیی دژی ماشینیکردن و وێرانکردنی داموودەزگاکان لە سەدەی 19دا 2 مرۆی دژەتێکنۆلۆژی (دژی بەکارهێنانی تێکنۆلۆژی نوێ) ◌ 1 لودیت 2 آدم ضدتکنولوژی

**ludic** /'lu:dɪk/ *adjective*

(فەرمی) 1 خۆبەخۆ، خۆیی، لەخۆوە، بەدەسخۆنەبوو، بێئیختیار 2 قۆشمە، شلوق، هاروهاج ◌ 1 خودجوش، خودانگیخته 2 بازیگوش

**ludicrous** /'lu:dɪkrəs/ *adjective*

پێکەنینی، گاڵتەجاڕ، absurd ،ridiculous: a *He is paid a ◊ ludicrous suggestion It was ◊ ludicrous amount of money ludicrous to think that the plan could succeed* ◌ مضحک

**ludicrously** /'lu:dɪkrəsli/ *adverb*

بە شێوەیەکی پێکەنینی، گاڵتەجاڕانە ◌ به طور مضحک

**ludicrousness** /'lu:dɪkrəsnəs/ *noun*

پێکەنینیبوون، گاڵتەجاڕبوون ◌ مضحک بودن

**ludo** /'lu:dəʊ, US -doʊ/ *noun,* US Parcheesi

(بریتانیا) مینجێن، کایەی مینج (لە لاتینەوە "یاری دەکەم") ◌ بازی منج

**lues** /'l(j)u:i:z/ *noun,* also lues venerea /vɪ'nɪərɪə/

1 فەرەنگی، 2 پەتا (بنەڕەت: لەلاتینەوە بە واتای "plague") ◌ 1 سفلیس 2 طاعون

**luetic** /l(j)u:'ɛtɪk/ *adjective*

1 سەربە فەرەنگی 2 پەتایی ◌ 1 سفلیسی 2 طاعونی

**luff** *noun*

1 ڕۆیشتنی کەشتی بەرەو با 2 خرترین بەشی کەشتی 3 قولایی تایبەتی هەڵگرتنی شتی قورس 4 تەکەتەکی باری گرانکێش یان جەڕوسەقیل لە جەوادا، تەکان و بەملاوبەولاداکەوتنی بار ◌ 1 حرکت کشتی در جهت باد 2 لوف 3 گردترین قسمت کشتی 4 لوف

**luffa**, *pl.* luffas = loofa

**Luftwafe** /'lʊftwafə, German 'lʊftvafə/ *noun*

هێزی ئاسمانی ئەڵمانیا تا کۆتایی شەڕی جیهانی دووەم (بنەڕەت: لە *Luft* "هەوا، ئاسمان" + *Waffe* "چەک") ◌ نیروی هوایی آلمان تا پایان جنگ جهانی دوم

**lug**[1] /lʌg/ *noun*

1 گۆڵکێشکردن، ڕاکێشان، ڕاکێشکردن، پەتکردن 2 سنووق، سیپ (بۆ هەڵگرتن یان ڕاگوێستنی میوە) ◌ 1 خرکشی، کشش 2 جعبه

**lug**[2] /lʌg/ *noun*

1 قولفە، دەسک 2 (نافەرمی) گوێ 3 (نافەرمی، زۆرتر لە ئەمریکای باکووری) مرۆی گەوج ◌ 1 دسته 2 گوش 3 آدم احمق

**lug**[3] /lʌg/ = lugworm

**Luganda** /lu:'gandə/ *noun*

لووگاندا (= زمانی بانتویی گەلی باگاندا Baganda) ◌ لوگاندا

**luge** /lu:ʒ, US lu:dʒ/ *noun*

لووژ (خێشکی وەرزشی، لە فەرەنسی سویسییەوە) ◌ لوژ

**Luger** /'lu:gə/ *noun*

(دروشمی بازرگانی لە ئەمریکا) جۆرێ pistol ی خۆکاری ئەڵمانی (لە ناوی شارەزای چەک George *Luger*) ◌ نوعی هفت‌تیر خودکار آلمانی

**luggage** /'lʌgɪdʒ/ *noun*

بارگەوبنە، بار، کەلوپەل، baggage ◌ بار و بنه

**luggage rack** *noun*

1 (شەمەندەفەر، پاس و هتد) ڕەفەی کەلوپەل 2 باربەست، باربەن(د) ◌ 1 رف اثاثیه 2 باربند

**luggage-van** *noun*

واگۆن یان عەرەبانەی بار ◌ واگن بار

**lugger** /'lʌgə(r)/ *noun*

لاگێر (کەشتییەکی چکۆلانە بە دوو یان سێ دارالاوە) ◌ لاگر

**lughole** /'lʌghəʊl, US -hoʊl/ *noun*

(نافەرمی) گوێ، گوێچکە ◌ (عامیانه) گوش

**lugsail** /'lʌgseɪl, US -s(ə)l/ *noun*

بادەوەی چوارسووچ ◌ بادبان چهارگوش

**lugubrious** /lə'gu:briəs/ *adjective*

پەشێو، خەفەتبار، خەمبار، دەسبەئەژنۆ، کز، ماتەمبار، دڵتەنگ، خەماوی، mournful: a

